# خەونامەی کوردی

## ئیبن سیرین
## نابلسی
## دمیری

کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی
سەید ئیبراهیم

وەرگێڕان و رێکخستنی بەپێی ئەلفبێی
کوردی
رزگار کەریم

٢٠٠٧ز

پڕۆژەی ١٠٠ کتێبی کوردی
٥٨

# خەونامەی کوردی

## ئیبن سیرین
## نابلسی
## دمیری


کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی
سەید ئیبراهیم

وەرگێڕان و ڕێکخستنی بەپێی ئەلفبێی کوردی
ڕزگار کەریم



٢٠٠٧ز

# بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

کتێب: خەونامەی کوردی
کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی : سەید ئیبراهیم
وەرگێڕان و رێکخستنی بە پێی ئەلفبێی کوردی : رزگار کەریم
ساڵی چاپ: ٢٠٠٧
ژمارەی سپاردن:
تیراژ:
لەبلاوکراوەکانی ناوەندی رۆشنبیر لەسلێمانی

# بەناوی خودای باڵاو مەزنەوە

## پێشەکی (نابلسی)

سوپاس و ستایش بۆ خودای مەزنی پایەدارو دروودوسڵاویش خورپڕژێ بەسەرگیانی پاکی پێغەمبەرویارو یاوران و خانەوادەو شوێنکەوتوانی هەتا رۆژی قیامەت.

پاشان...

زانیاری خەو یەکێکە لەزانستە بەرزەکان و بەنرخ و گرنگبوە لەژیانی پێغەمبەراندا و بەبەشێك لەنیگاکاندانراوە چونکە پێغەمبرایەتی بەسەرچوەو مـژدەو دڵخۆشـکردن مـاوە کەلەخەودا خۆیدەبینێتەوە.

لەوسۆنگەیەوە کتێبێکم دانا بەپێی ئەلفبێی زوبانی عەرەبی هـەتا بەئاسانی بەکاربهێنرێ و کتێبەکەشم ناونا (تعطير الأنام في تعبير المنام) و داواخوازم توێشوویەکبێت بۆم لەرۆژی قیامەتدا ، سەرەتای کتێبەکەم بەم پێشەکییە زانستییە دەستپێکردوە ...

خوداوەند دەفەرمویێ: ﴿لهم البشرى في الحياة الدنيا وفي الآخرة لا تبديل لكلمات الله ذلك هو الفوز العظيم﴾ (يونس:٦٤)

هەندێك لەراڤەکاران دەڵێن: مەبەستی خەوی باش و خۆشە ، مـرۆڤ دەیبینێ یان نیشانیدەدرێ لەدنیاداو لەقیامەتیشدا بەدیکردنی رووخساری پەروەردگارە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "ئەوەی بڕوای بەخەوی باش و خۆش نەبێت بڕواشی بەخوداو قیامەت نییە"*

خاتوو (عائشە) (رەزای خوای لێبێت )دەفەرموێت: سەرەتای نیگای پێغەمبەر(ﷺ )بەخەوی باش دەستپێکرد ، هەر خەوێکی دەبینی دەهاتەدی.

لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ )دەگێڕنەوە بە(ئەبوبەکری سدیق)ی فەرموە: "ئەی ئەبوبەکر لەخەودابینیم من و تۆ بەرزدەبووینەوە دوو پلە لەپێش تۆوەبووم"[1] (ئەبوبەکر)یش (رەزای خوای لێبێت دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر (ﷺ ) خوداوەند روحت

---

* سەرچاوەی ئەم فەرموودەیە نەنووسراوە. (وەرگێڕ).

[1] (ئیبن سعد) لە (الطبقات) (١٣/٣)هێناویەتی.

دەکێشێ‌و منیش لەدوای تۆ دووساڵ‌و نیو دەژیم ، هەروەها دەگێڕنەوە پێغەمبەر(ص)بە(ئەبوبەکر)ی فەرموە: "لەخەودا بینیم مەڕی ڕەش شوێنکەوتوە پاشان مەڕی سپیش دوای ڕەشکەوتوە" (ئەبوبەکر) دەفەرموێ: (عەرەب) دوای تۆ دەکەون‌و (عەجەم)یش دوای (عەرەب).

خوداوەند زانستی خەوی بەخشی بەحەزرەتی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت - و لەوبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وكذلك يجتبيك ربك ويعلمك من تاويل الاحاديث﴾ (یوسف /٦) مەبەستی زانستی خەولێکدانەوەیە ، ئەم زانیارییەش یەکەم زانیارییە لەڕووی مێژوویییەوەو بەڕێزترین زانیاریبوە لەسەردەمە جیاجیاکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا.

هەندێك لەبێباوەڕان هەڵدەستن بەپووچەڵکردنەوەی زانستی خەو لەوبارەیەوە دەڵێن: بینینی خەو لەچوار دیمەن بەدەر نییە: ئەگەر ڕەشی بینی ڕووداوەکان بەڕەشبینی دەبینێ‌و ئارەزووبازە، ئەگەر ڕەنگی زەردی بینی ئاگرو گڵۆپ‌و خوێن شتی زەرد دەوبینێ، ئەگەر تف‌و بەڵغەمی بینی ئاوو ڕەنگی سپی‌و شەپۆل دەبینێ، ئەگەر خوێنی بینی مەی‌و ئامرازی مۆسیقی دەبینێ، ئەم گوفتارەش بەشێکە لەخەوو سەراپای زانستی خەوی تێدا کۆنابێتەوە، چونکە هەندێك لەو جۆرەخەوانە دەگەڕێتەوە بۆ وتەو قسەکانی نێودەروون‌و بەشێکیشی دەخرێتە پاڵ شەیتان، ئەو خەوەشی بەهەڵت‌و تێکەڵ ناوزەدکراوە لەو گژوگیاو سەوزەیەوە وەرگیراوە کەمرۆڤ لەزەوی گورزیدەکات‌و درێژوکورتی تێدایە یان ڕەنگی جۆراوجۆرو وشك‌و سەوز، هەر بۆیە خوداوەند دەفەرموێت: ﴿وخذ بيدك ضغثا فاضرب به ولا تحنث انا وجدناه صابرا نعم العبد انه اواب﴾ (ص:٤٤).

هەندێکدەڵێن: خەو سێبەشە:

١)خەوێك مژدەیە لەلایەن خوداوە بەخەوی باش ناوبراوەو فەرموودەی زۆری لەسەرهاتووە.

٢)خەوێك ئاگادارییەو لەشەیتانەوەیە، ئەم جۆرەش بەهەند ناگیرێ‌و بەتاڵە لەمبارەیەوە دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای پێغەمبەری خوا(ﷺ)و دەڵێت: ئەی

پێغەمبەری خوا لەخەودا بینیم سەرم لێکرابوەوە دوایکەوتبووم " پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: " باسی یاریی پێکردنی شیتان مەکە لەخەودا" [٢].

٣)خەوێك قسەوگوتەی نێوناخی مرۆڤ خۆیەتی وەك ئەوەی مرۆڤ کەسێکی خۆشەویستی ببینیێ یان بترسێ لەشتێك یاخود برسیبێت‌و خەو بەبرسێتییەوە ببینیێ یان گەدەی پڕبێت‌و برشێتەوە یا لەبەر تیشکی خۆردات بخەوێت‌و پاشان ببینیێ لەخەودا دەسووتێ، یان لەئەندامەکانی لاشەیدا ئێش‌و ئازار هەبێت‌و ببینیێ سزاو ئەشکەنجەدەدرێت.

## خەوی پووچ و بەتاڵ (شەش) بەشە:

یەکەم//وتەی نێودەروون کەلەغەم‌و پەژارەوە هیواو ئومێدو کاروباری تێکەڵ‌و پێکەڵدا خۆی دەبینێتەوە.

دووەم//خەوێك خۆشۆردن بەپێویست بگێڕێ‌و هیچ لێکدانەوەیەك هەڵنەگرێت.

سێیەم//ترساندن لەشیتانەوە یان گەورەکردنی حاڵ‌وبارێك.

چوارەم//ئەوەی جادووگەرانی مرۆڤ‌و جنۆکە دەبینن.

پێنجەم//ئەوەی شەیتان دەیهێنێت بەسەر مرۆڤدا.

شەشەم//بینینی ئێش‌و ئازارێك یان نەخۆشی‌و باروحاڵێك بیست ساڵ یان ساڵانێکی دووورودرێژی بەسەرا تێپەڕبوبێت.

---

[٢] (ئەحمەد) لە(مسند)ەکەیدا (٢٣٦٩١)لەرێگەی(عەلی)ی کوڕی (یزید)و (هەیسەمی) لە (المجمع)دا(٥/١٨٠)هێناویەتی‌و دەڵێت: (ئەحمەد هێناویەتی بەلام (عەلی)ی کوڕی (یزید)ی تێدایە لاوازە بەلام سەرجەم پیاوانی دیکە جێگەی متمانەن.

## خەوی راستو دروستیش ( پێنج )بەشە :

یەکەم//خەوێکی راستی دیارو بەرچاو: بەشێکە لەپێغەمبەرایەتی بەپێی ئایەتی: ﴿ لقد صدق الله رسوله الرؤيا بالحق لتدخلن المسجد الحرام ان شاء الله﴾.(الفتح /٢٧)نموونەی ئەم خەونە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ بەرەو (حودەیبییە) بەرێکەوت لەخەودا بینی خۆیو یارانی چوونە نێو شاری (مەککە)ەوەو بەدڵنیاییو بێترسو بیمو، بەدەوری (بیت)دا سووڕانەوەو ئاژەڵەکانیان سەربڕیو پاشان سەریان تاشی یان کورتیانکردەوە.

لەخەودا مژدەدرا بەپێغەمبەری خوا(ﷺ) لەلایەن پەروەردگارەوە.

هەروەها وەك خەونەکەی (ئیبراهیم) (سەلامی خوای لێبێت) کاتێ بینی جگەرگۆشەکەی سەردەبڕێت وەك خوداوەند لەقورئانی پیرۆزدا باسیکردوەو دەفەرموێت: ﴿ يا بني اني ارى في المنام اني اذبحك فانظر ماذا ترى... ﴾ (الصافات /١٠٢).

دووەم//خەوی باش کەمژدەی لەلایەن خوداوەندەوە بۆ بەندەکانی هەڵگرتووە ، هەروەك خەوی ناخۆشیش سەرزەنشتی تێدایە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ بەندەکانی ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: "باشترین دیمەنی خەو ئەوەیە یەکێکتان خوداوەند یا پێغەمبەرەکەی یاخود باوكو دایکی موسوڵمانی ببینێ" یارانیش پرسیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئاخۆ کەس خوداوەند دەبینێت؟ فەرمووی: " دەستەڵاتدار دەستەڵاتدار خوداوەندی باڵایە"

سێیەم//ئەو خەونەی فریشتەی خەوبینین نیشانی بەندەی دەدات ، دەگونجێت رووداوێکی هەڵگرتبێ بۆ خەوبینەر لەداهاتوودا بەدیبکات.

چوارەم//ئەو خەونەی بەڵگەونیشانەی تێدایە وەك ئەوەی مرۆڤێك ببینێ لەحەمامدا قورئاندەخوێنێ یاخود سەمادەکات ئەوە لەکارێکی خراپو ناقۆڵادا ناوبانگدەردەکات چونکە حەمام شوێنی دەرخستنی عەورەتەو فریشتەکان ناچنە نێوی.

خەوی ژنێك لەخولی مانگانەدابێ یان ئەوەی لەشیگرانبێ لەگەڵ بێبتاوەڕو ئاگرپەرست گونجاوەو دەبینین (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت) خەوی پادشایەکی بێباوەڕی راڤەوکرد، خەوی منداڵانیش گونجاوە چونکە (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت) منداڵی حەوت ساڵانبوو خەوێکی بینیو دروستو گونجاوبوو.

(دانیال) (سەلامی خوای لێبێت ) دەڵێت: ناوی فریشتەی بەرپرسی خەو(صدیقون)ەو فریشتەیەکی ئیجگار گەورەو مەزنە [٣] .

هەروەها جیاوازی شوێن‌و جێگە رۆڵێکی تایبەتدەبینێ لەراڤەکردنی خەودا ، بۆیە راڤەکارانیش ئاماژەیان بەو جیاوازییەداوە، لەم روانگەیەوە ساردی‌و گەرماو باران‌و بەفر رۆڵی خۆی‌و لێکدانەوەی تایبەتیان هەیە لەخەودا ، بۆنموونە: ئەوەی لەولاتو شارێکی گەرمدا بەفرببینێ بەڵگەیە لەسەر گرانی‌و بلاوبوونەوەی قاتو قڕی، بەلام ئەگەر بەپێچەوانەوەبوو فراوانی‌و فەرپیتە.

*قوڕوچلپاو بۆ خەڵکی (هند)ماڵو سامانەو بۆ خەڵکی شوێنانیتر بەلاونەهامەتییە هەروەك چۆن بالێبوونەوە لای ئەوان مژدەو شادییە بۆ خەڵکیتر قسەی ناقۆلایە.

ماسیش لەهەندێك ولاتدا پیسی‌و گەندەڵییەو بۆ هەندێکی دی فرەهاوسەرییەو بۆ جووڵەکە بەلاو نەهامەتییە.

ئەگەر مەردوم خوازیاری خەونێکی راستو دروستبێت با راستگۆبێتو غەیبەت نەکاتو قسەهەڵنەبەستێ، ئەگەر خەوبینەر درۆزنبوو بەلام رقی لەدرۆبوو کەسانیتر بۆیانەدەکرد خەوەکەی راستدەبێت، ئەگەر درۆیکردو خەشمو قینی لەدرۆنەبووەوە خەونەکەی راست نییە.

واباشە مەردوم بەدەستنوێژەوە بنوێت، ئەگەر کەسێکی خۆپارێزنەبوو خەوی بینی‌و هیچ بیری نەمابوو بەهۆی خراپی نیەتو زۆری گوناهیەوە یان غەیبەتو قسەهەڵبەستن دەبێت راڤەکاری خەر ئەگەر خەوی وایان بۆبگێڕایەوە بەزوبانێکی گەشبینانە وەلامی بداتەوەو بواری پێبدات خەوەکەی بگێڕێتەوە بۆی‌و دەبێت کەم‌وکورییان بشارێتەوە [٤] .

هەندێ لەزانایان دەڵێن: دەبێت راڤەکاری خەو کاتێ راڤەی خەودەکات رەچاوی پلەوپایەو ئاین‌و کاتو سەردەم‌و ساڵو رۆژو شەو بکات.

---

[٣] (نابلسی) رۆدەچێت لەباسی ئەو فریشتەیەداو زۆر باسیدەکات کەهیچ سەرچاوەیەکی زانستی تێدانییە بۆیە ئەو باسەم لابرد لەبیانەی پێشەکیەکەی نابلسی)دا. (وەرگێڕ)

[٤] دوای ئەم دەقە(نابلسی) رەوشی راڤەکاری خەو دەخاتەروو کەلەپێشەکی (ئیبن سیرین)دا ئامـاژەیی پێکراوە بۆیە وەرنەگێڕاوە. (وەرگێڕ)

# کۆتایی پێشەکی (نابلسی)

لەم کۆتاییەدا بەپێویستمزانی هەندێك باس و خواس بخەمەڕوو کەلەپێشەکییەکەدا باسمەنەکردبوە..

کتێبەکەم لەسەرجەم پێشەوایانی راڤەکار کۆکردوەتەوە[٥].

شایانی باسە لەم کتێبدا سوودم لەسەرجەم(خەونامەکان)یان وەرگرت و بەدەگمەن لێدانەوەو راڤەیەکم فەرامۆشکردبێ و ئەوی تۆمارمکرد کورت و ئاسان بەکاردەهێنرێ[٦].

## راڤەکارانی خەو بەتان و پۆی مێژوودا

١) **پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت):** وەك(ئیبراهیم)و (یەعقوب)و (یوسف)و (دانیال)و (زولقەرنەین)و (محمد) (سەلامی خوایان لێبێت).

٢) **هەندێك لەیارانی پێغەمبەر (ﷺ):** وەك (ئەبوبەکر)و (عومەر)و (عوسمان)و (عەلی)و (عەبدوڵڵای کوڕی عەباس)و عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص)و (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر)و (عبدوڵڵای کوڕی سەلام)و (ئەبی زەری غەفاری)و (ئەنەس)و (سەلمانی فارسی)و (حوزەیفەی یەمان)و خاتوو(عائیشە)و (ئەسمای) خوشکی(رەزای خوایان لێبێت).

٣) **راڤەکاران لەتابعین:** (شوێنکەوتوانی یاران وەك (سەعیدی کوڕی مسیب)و (حەسەنی بەسری)و (شەعبی)و (زەهری)و (ئیبراهیمی نەخعی)و (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)و (قەتادە)و (موجاهید)و (سەعیدی کوڕی جوبەیر)و (تاووس)و (سابتی بەنانی).

٤) **راڤەکارانی خەو لەزانایان:** کەلەدواتی ئەوان هاتووەن وەك (ئەبوسەور)و (ئەوزاعی)و (سوفیانی سەوری)و شافعی) (ئەبو یوسفی قازی)و (ئیبنئەبی لەیلا)و (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)و (عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك).

---

[٥] لێرەدا (نابلسی) ناوی چەندین زانای تۆمارکردوە کەسوودی لێوەرگرتبوون لەراڤەکارانی خەوو لەبەر زۆرییان تۆمارم نەکردن. (وەرگێڕ)

[٦] لێرە بەدواوە باس لەکاتی لێکدانەوەی خەودەکات کەلە پێشەکی (ئیبن سیرین)دا ئاماژەی پێکراوە. (وەرگێڕ).

٥ )**ڕاڤەکارانی خەو لەخواناسان ( ڕەزای خوایان لێبێت ):** وەك (محمد )ی کوڕی (واسع)و (تەمیمی داری)و (شەقیقی بەلْخی)و (مالیکی کوڕی دینار)و (سلێمانی تەیمی)و (منسووری کوڕی عەمار)و (محمدی کوڕی سەمان)و (یەحیای کوڕی مەعاز)و (ئەحمەدی کوڕی حەربی).

٦ )**ڕاڤەکارانی خەو لەوانەی خاوەنی کتێبو نووسینن لەوبوارەدا:** وەك (محەمەدی کوڕ سیرین) و (ئیبرتاهیمی کوڕی عەبدوڵڵای کرمانی)و (عەبدوڵڵای کوڕی موسلیمی قوتەیبی)و ...

٧ )**ڕاڤەکارانی خەو لەفەیلەسوفەکان:** وەك(ئەفلاتون)و (مهرادیس)و (ئەرستاتالیس)و (بەتلیمۆس)و (یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کندی)و..

٨ )**ڕاڤەکارانی خەو لە پیزشکان:** وەك (جالینۆس)و (بقرات)و (بەختیشوع)و (ئەهزان)و (محمدی کوڕی زەکەریای رازی).

٩ )**ڕاڤەکارانی خەو لەجوولەکە:** وەك (حویەی کوڕی ئەختەب)و (کەعبی کوڕی ئەشرەف)و (موسای کوڕی یەعقوب).

١٠ )**ڕاڤەکارانی خەو لەمەسیحیەکان:** وەك (حەنینی کوڕی ئیسحاقی وەرگێڕو ئەبو مەخلەدو (زەیدی تەبەری)).

١١ )**ڕاڤەکارانی خەو لەئاگرپەرستان:** وەك (هورمزی کوڕی ئەردشیر)و (بوزرجمهری کوری بەختکان)و (ئەنوشیروان) پادشای دادپەوەرە.

١٢ )**ڕاڤەکارانی خەو لە موشریکەکانی عەرەب:** وەك (ئەبوجەهل)و (عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی نەوفەل)و (ئەبوتالیب)و (ئەبوعاصی).

١٣ )**ڕاڤەکارانی خەو لەکاهینەکان:** وەك( سەتیح)و (شەقیقی خەزرەجی)و (عەوسەجە)و قەنامی)و (ئەبوزەرارە).

١٤ )**ڕاڤەکارانی جو لەجادووگەران:** وەك (عەبدوڵڵای کوڕی هیلال)و (قورتبوبی کوڕی زەیدی سەلی)و...

١٥ )**ڕاڤەکارانی خەو لەفیراسەداران:** وەك (سەعیدی کوڕی سینان)و (ئیناسی کوڕی موعاویە)و (جندەلی کوڕی مەحکەم)و (موعاویەی کوڕی کەلسووم).

بەم پێیە زانستی لێکدانەوەی خەو لق و پەلی زۆری لێبوەتەوەو لەبەشێکدا مۆڵناکرێ، ئەم پێشەکییە بەسە بۆ خاوەن ژیریو عاقڵو خوداوەندیش پەناوپشتگیری هەمووانەو سوپاسو ستایش بۆ خوداو سلاوبباریێ بەسەر گیانی پێغەمبەردا (ﷺ).

لەرۆژی (٥)شەممەی ساڵی ١٠٩٦کۆچی لەنووسینی ئەم کتێبە بوومەوە.

# پێشەکی لێکۆڵەرو توێژەری عەرەبی

سوپاس‌وستایش بۆ خوداوەندو درودی بێپایانیش خورپرژێ بەسەر گیانی پاکی پێغەمبەر(ﷺ) کەوا هیچ فرستادەیەك نییە لەدوایی ئەو...

پاشان...

کاتێ لێکۆڵینەوەی کتێبی (تفسیر الاحلام)و (تعطیر الانام)ی هەریەك لە (ئیبن سیرین)و (نابلسی) خرایەئەستۆم نیازی دەروونم روو بەپەروەردگار رامکردو دەستمدایە خوێندنەوەی هەردوو کتێبەکە ، کاتێکیش بابەتەکانی هەردوو کتێبەکەم تاوتوێکرد ئەوەم بۆدەرکەوت هەردوو کتێبەکە یەك دەستەواژەیان لەخۆگرتوە بەدەر لەهەندێك زیادەی (نابلسی).

هەرچەندە کتێبەکەی (ئیبن سیرین) لەسەر دەروازەو بەش رێکخراوە، بۆنموونە : ئەگەر بۆ ((کەڵەشێر))بگەڕێیت دەبێت لەکۆتایی کتێبەکەداو لەبەشی ئاژەڵ‌و باڵندەدا لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی بگەڕێیت ئەوجا خەوبینین بە((کەڵەشێر))ەوە دەبینیتەوە ...بۆیە خوێنەر ماندووشەکەت دەبێ ئەگەر رانەهاتبێت‌و ئاگاداری شێوازی ئەم کتێبە نەبێت ، بەڵام کتێبەکەی (نابلسی)لەسەر شێوەی پیتەکانی فەرهەنگی عەرەبی رێکخراوە بۆنموونە: ئەگەر بەدووی ((کەڵەشێر ـ دیك))دا بگەڕێیت بەپێی فەرهەنگی عەرەبی لەپیتی (دال)دا دەیدۆزیتەوەو خوێنەر بەئاسانی دەگات بەوەی بەدوایدا دەگەڕێت.

پاش لێکۆڵینەوە بیرم لەوەکردەوە کتێبەکەی (ئیبن سیرین) وەك ئەوەی (نابلسی) رێکبخەم ، کاتێکیش دەستمدایە کارەکە بڕیارمدا هەردوو کتێبەکە لەیەك کتێبدا کۆبکەمەوەو ناوی بینێم((تفسیر الاحلام وتعطیره ـ قدیمه وحدیثه ))

خەونامەی دێرین و نوێ و، چاکی کارکردنم لێهەڵماڵی و کارەکەم بەم شێوەیە دەستپێکرد:

١) سەرەتا بەکتێبەکەی (نابلسی) دەستمپێکردو بەچەقی بنەڕەتمدانا بۆ نموونە کاتێ (ئادەم) ـ سەلامی خوای لێبێت ـ دەهێنم پاش ئەوەی لای (ئیبن سیرین) هێناومە دوا بەدوای ئەوە لای (نابلسی) دەیهێنم و ئەوەی دووبارەکان لابردوە.

٢) بابەتەکانی کتێبەکەی (دمیری) (حیاه الحیوان) م خوێندوەتەوەو ئەوەم بۆدەرکەوت (نابلسی) باسیکردوە یاخود کەمێکی لای (ئیبن سیرین) هاتوە، ئەگەر زیادەیەکیش لای (دمیری) هاتبێت تۆمارمکردوە.

٣) باس و خواسە سەیرەکانم باسکردوە و لەسەری دراوم.

٤) هەندێك لەسوودوقازانجم لەم کتێبەدا باسکردوە بەتایبەت ئەوەی سەبارەت بەئاژەڵ باسکراوە.

٥) ئایەت و فەرموودەکانی هەردوو کتێبەکەم (تخریج) کردوە گەڕاندومەتەوە بۆ سەرچاوەکەی.

لەکۆتاییدا پشت بەخوای بالآدەست کتێبێکی خەونامەی گشتگیرم ئامادەکردوە هەرسێ کتێبەکەی لەخۆگرتووە: (تفسیر الاحلام ـ تعطیر الانام ـ حیاة الحیوان) بەبێ ئەوەی ناتەواوی و بواردنی بنەڕەتی لەهیچکامیاندا هەبێت.

ئومێدەوارم ئەم کتێبە خوداوەند لێم قبوڵ بفەرموێ چونکە ئەو باشترین گەورەو پشتگیرو شکۆمەندە.

## تێبینی:

كتێبیی (تفسیر الاحلام) دراوەتەپاڵ (ئیبن سیرین) زووربەی هی (ئەبی سەعدی نامۆژگاریكار)و كەسانیترە، ئەوەشی لەم وتەیەروونترە ئەوەیە (نابلسی) لەكۆتایی كتێبەكەیدا باسی لەو مامۆستاو ریشسپیانەكردوە كەزانیاری لێوەرگرتتوون و (هەشت)كەسن و تێیدا باسی (ئیبن سیرین)ی نەكردوە، لەكاتێكدا ئەو دەستنووسەی (تفسیر الاحلام)ەكەی (ئیبن سیرین) لە(دە) لاپەرە تێناپەرێت، ئەمەش بۆ ئەمانەتپارێزی زانیاری، بۆیە دەتوانم بڵێم كتێبەكەی (ئیبن سیرین) هی خۆی نییەو كتێبەكەی (نابلسی) هی خۆیەتی و لەوسەرچاوانەوە وەریگرتووە لەكۆتایی كتێبەكەیدا ئاماژەی پێداوە، ئەم روونكردنەوەیەشم بەپێویست زانی.

ئەبو حەفص

سەید ئیبراهیم صادق عمیران

منیا ـ مانگی رەبیعول ئەوەل

ساڵی ١٤٢١ هـ

# پێشەکی (ئیبن سیرین)

سوپاس و ستایش بۆ خوداوەندی جیهانیان درودی بێپایان بۆسەرگیانی پێغەمبەری گەورەمان (محمد) (ﷺ)و یارویاوەرو خانەوادەی پاك و بێگەردی...

ئەوەی لێرەدا پێوستە بزانرێت خەو بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت بەدووبەشەوە: بەشێکی لەلایەن پەروەردگارەوەیەو بەشێکی تریشی لەلایەن شەیتانەوە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کەدەفەرموێت: "خەو دووبەشە یا لەلای پەروەردگارەوەیە یاخود لەلای شەیتان"[1].

ئەو خەونەی دەدرێتەپاڵ خوداوەند راست و دروست و باشەو پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ) بەبەشێك لەچل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی داناوە[2].

زۆرجاریش بێباوەڕو خراپەکاران دەگونجێت لەمجۆرە خەونەببینن، بەلاّم ئەوەی کەدەدرێتە پاڵ شەیتان و پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێکردووین نەیدرکێنین و تف بکەین بەلای چەپداو، بەڵێنیداوە بەوەی ئەم رێنومایییانە جێبەجێدەکات زیانی پێنەگات[3].

ئەو خەوەشی باش نییە دەگونجێت غەم و پەژارەبێت یان ترساندن و ببێتە مایەی فیتنەو قۆڵبڕین بەبێئەوەی ئاگاداری وەرگرتبێ لەکەوتنەنێو داوی گوناهو تاوانەوە ، بەلاّم سەرزەنشت و بێداری لەخۆدەگرێت وەلێ شەیتانی نەفرەتلێکراو شیاونییە فەرمان بەچاکەبکات یا بەندەکانی پەروەردگار بێداربکاتەوە ، چونکە پەروەردگار بەدیهێنەری سەرجەم گەردوونەو خێروشەڕ هەربەدەستی خۆیەتی ، هەروەها جیاوازی هۆکارەکان کەدەبێتە هۆی ئەنجامدانی خۆشتن دەدرێتە پاڵ شەیتان و ئەو

[1] (بوخاری) فەرموودەی ژمارە (٥٧٤٧)و (مسلم) لە(١٧٧١).
[2] (بوخاری) فەرموودەی (٦٩٨٧)و(مسلم) لە(١٧٧٤٩.
[3] (بوخاری) فەرموودەی (٥٧٤٧)و(مسلم) لە(١٧٧١/٢/٤).

ورتــە ورتو وەسوەســانەی بەدەروونــدا دێــت لەگــەڵ غــەمو پــەژارەو رووداوە بێمەبەستەکان دەگەڕێتەوە بۆ دەروونی خەوبینەر.

ئەو حاڵوبارەشی رووەدەکاتە نوستوویەکی گەدەپڕ لــەخواردن یــان بــەتاڵی وەك ئەو حاڵو بارەوایە کەلەکاتی بێداریدا رووی تێــدەکاتو دەگونجێــت هــیچ ســوودو قازانجێکی نەبێتو سروشتی مەردوم رۆڵی تایبەتی تێدانەگێڕیو بەهــەمان شــێوە شەیتانیش رۆڵی تێدانییەو سەرجەم باروحاڵەکان بەدەستی خوداوەندە.

سروشتی کردگاریەتی پەروەردگاریش بەچەشنێکە خەونی راست پێکــدەهێنێو فریشتەکان ئامادەی بینینی دەبنو دەدرێتەپاڵ خوداوەند، لەروویــەکی دیکەشــەوە پــەروەردگار خــەوی پــووچو بــەتاڵو تێکــەڵ دروســتدەکات لــەکاتی ئامادەکــاری شــەیتانداو دەدرێتــە پــاڵ دەروونــی ئەهریمــەنو شــەڕەنگێزی شــەیتان، ئەوەشــی درۆدەکاتو خەوبەدرۆ هەڵدەبەســتێ درۆی بــەدەمی خــوداوەکردوەو خەوبینــەریش نابێت خەونەکــەی بــۆ هــەموو کەســێك بگێڕێتــەوە مەگــەر راڤــەکارێکی زانــاو ئامۆژگاریدەرو خێرۆمەندبێت.

## ئەوەی پێویستە لەکاتی بیستنی خەودا بکرێ

واپێویستدەکات راڤەکاری خــەو نهێنــیو بابەتــەکانی نێــو خــەونی باســکراو بپارێزێو بەشێوەیەکی گشتی بەخەوبینەر بڵێ: خێرە بۆ تۆو خراپە بــۆ دوژمنانــت یاخود شەڕێکە پارێزراوەبێت لێی، ئەگەر واهەســتیکرد ئــەم خەونــە وابەســتەی خەوبینەربوو...

بەڵام ئەگەر وابەســتەی جیهــانبوو دەبێــت بڵــێ: خێــرە بــۆ ئێمــەو خراپــە بــۆ دوژمنانو بەمشێوەیە.

هەروەها دەربڕینی خەون لەبەرەبەیانــدا باشــترە بۆبینــەری چــونکە بیروهۆشــی لەسەرخۆیەتیو غەموپەژارەکانی بۆساتێکیشبێت رەویوەتەوەو سەبارەت بەفەڕداری

بـەیانو رۆژی نـویّ پێغەمبـەری ئازیزمـان (ﷺ) دوعادەکـاتو دەفـەرموێت: "پەروەردگارا فەرپییت بخەرە بەیانو سپێدەی نەتەوەکەم"[٤]

راڤەکاری خەویش لەلای خۆیەوە نابێت بەدەستەواژەی نادیار خەونەکە دەربڕیّو راوبۆچوونی ئەستێرەگەران بەهەند وەربگریّو پێغەمبەر (ﷺ) ناچێتە سەرشێوەی شەیتانو ئەوەی بەدیبکات حەقو راستییە[٥].

مردووش لەلانـەو مـاڵی حەقدایـەو ئـەوەی لەخەونەکەیدا دەیلێت راستەو لەفتنەو ئاشـوب پـارێزراو دەبێـت، بەهـەمان شـێوە منـداڵێك هـەرگیز نـازانێ درۆبکات لەگەڵ وتەی ئاژەڵو گیاندارانو هاتنەگۆیان حەقو راستییەو نیشانەی سەراسیمەییە.

هەموو درۆزنێکیش لەکاتی بێداریدا وەك کاهینو ئەستێرەوان وتـەی درۆیـەو بەلای راسـتدا ناچێت ، کەسـانی لەشـگرانو مەسـتو بێئاگـا لـەلاوو هـەرزەو خەڵکیتر خەونەکانیان هەندێکجار راستەو شـەیتان بەسـەریاندا زاڵـە بەدرێژایی سەردەمو رۆژگار.

هەروەها راڤەکاری خەو پێویستی بـەوە هەیـە لـەقورئان نموونـەو پەنـدەکانو وەربگریّو خوداوەند دەفەرموێ: ﴿واعتصموا بحبل الله جميعا﴾(ال عمران: ١٠٣)، هەروەها وتەی سەبارەت بەدووڕووەکان: ﴿كانهم خشب مسندة﴾ (المنفـاقون : ٤)و ئایـەت: ﴿ ان الملوك اذا دخلوا قرية افسدوها ﴾ (النمـل: ٣٤) و ئایەتی: ﴿ ان تستفتحوا فقد جاءكم الفتح ﴾ (الانفال:١٩) و ئایەتی: ﴿ أيحب احدكم ان ياكل لحم اخيه ميتا ﴾ (الحجرات: ١٢).

هەروەها پێویستی بەزانینی دانـایی پێغەمبـەرانو وتەشـیرینەکانیان دەبێـتو بەهەندگرتنی هـەواڵو وتـەی شـیرینی پێغەمبـەر (ﷺ) لەگـەڵ پەنـدەکانی وەك

---

[٤](ترمذي) (١٦٦٢)و(ئیبن ماجە) (٢٢٣٦)و (ئەحمەد) لە(مسندە)ەکەیدا : (٤١٧/٣).

[٥](ترمذي)(٢٢٧٦) لە (شمائل)دا (٢٤٢)و (اسناد)ەکەی (صحيح)ە.

فەرمایشتی: "پێنج شت خراپو بەدن"[٦] لەنێو ئەو پێنجەدا باسی قەلەڕەشو مشكو دووپشكو مشككگرەو سەگی وەڕیوو لورە لوورکار. هەروەها وتەی سەبارەت بەژنان "ئاگاداری شووشە ئاساکان بن "[٧] ـ مەبەستی ژنانە لەناکسیدا ـ .

هەروەها ڕاڤەکاری خەو پێویستی بەپەندە گرنگو بەسوودەکان دەبێت وەك:

(١)وتەی (ئیبراهیم) (سەلامی خوای لێبێت) سەبارەت بەهاوسەرە ناسوپاسگوزارەکەی (ئیسماعیلی کوڕی) دەفەرموێت: "لاشیپانی دەرگای ماڵەکەت بگۆڕە" ـ ئاماژەیەکە بۆ جیابوونەوەی لێی ـ .

(٢)وتەی (مەسیح) (سەلامی خوای لێبێت) کاتێ دەچێتە ژوورەوە بۆ لای ژنێکی داوێنپیسو ئامۆژگاریدەکات: "پزیشك دەچێتەی لای نەخۆش " لێرەدا مەبەستی لەپزیشك زانایەو بەنەخۆشیش بێئاگایەکی گوناهبارە.

(٣)وتەی (لوقمان) (ڕەزای خوای لێبێت) بۆ جگەرگۆشەکەی: "جێگەکەت بگۆڕە"واتە: هاوسەرەکەت.

(٤)وتەی (ئەبوهورەیرە) (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێ گوێی لێبوو یەکێك دەیگوت: "دەجال سەریهەڵدا "ئەویش وتی: "درۆیەکە بۆیەچییەکان" هەڵیان بەستوە.

هەروەها پێویستی بەهۆنراوەو مەبەستی شاعیران هەیەو لێکدانەوەی بەیتەشیعرەکانیش زانیاریو دیدی ڕاڤەکار فراوانتردەکات.

وێڕای ئەو زانیارییانە پێویستی بەزانستی زمانەوانیو ماناکانی هەیە بۆ نموونە:

١)"بێباوەڕی" لەزوبانی عەرەبیدا بەمانای داپۆشین یان شاردنەوە هاتوە.

٢)"لێخۆشبوون" بەمانای داپۆشین هاتوە.

---

[٦](بوخاری) (١٨٢٨) و (موسلیم) (١٢٠٠/٧٣/٤) (نووی).

[٧](بوخاری) (٩١٤٩) و (موسلیم) (٢٣٢٣/٧/٨) (نووی) وەك ئەو.

٣)"ستەمو زۆرلێکردن" بەمانای دانانی شتێك لەجێی ناشیاودا هاتوە.

٤)"خراپــە" بــەمانای دەرچــوونو دەرکــەوتنهاتوەو هاوچەشــنی ئەمانــەزۆرن لەزوبانی عەرەبیدا.

هەروەها پێویستی بەباسکردنی حاڵی خۆی هەیە لە:

١ـ خواردنو خواردنەوەی حەلاڵ.

٢ـ دڵسۆزبێت لەکارەکانیداو لای خەڵکی نموونەو پێشەنگبێت.

سەرباری ئەو خاڵانە دەبێت ئاگاداری ئەم بنەمایانەی لایخوارەوەبێت:

**یەکەم/خەوی راستو دروست دوویەشە:**

١)خەوێك دیارو بەرچاوەو پێویستی بەلێکدانەوە نییە.

٢)خەوێك شاراوەو ئاڵۆزەو پێویستی بەدانایيو ناوەرۆك هەیە.

**دووەم/وادەکانی خەو گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ راڤەکارو دەبێت رەچاوی ئەم خاڵانە بکرێ:**

١ـ ئەو خەونەی لەهاوین یان زستاندا دەبینــرێ جیــاوازە بــەپێی کــاتو وادەی خۆیو ناوەڕۆکیو بوونی پێکهاتەکانی وەك: دارو درەخت، خورمــاو دەریــاو ئــاگرو جلوبەرگو ماڵولانەو دووپشكو مار.

٢ـ لێکدانەوەی رووداوەکان لەشەوو رۆژدا تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە لەگــەڵ پێکهاتەکانی وەك: رۆژو مــانگو هەســارەو چــراو روونــاکیو تــاریکیو ژیــشكو کوندەپەپوو هاوچەشنی ئەمانە.

٣ـ سروشتو خووی مرۆڤ لەخەودا رۆڵێکی تایبەتی دەبینيو لەکاتێکــەوە بــۆ کاتێکیتر جیاوازی هەیەو هەرکەس بەپێی حاڵی خــۆی ئــەو پێکهاتــەو رەفتارانــە لێکدەداتەوە، وەك ئەوەی فێرە لەخەودا گۆشت بخوات یان ئەگەر درهــەمو دینــاری بینی سوودو قازانجدەکات لەکاتی بێداریدا یان ئەگەر بارانی لــەکاتی خــەودابینی

لەکاتی بێداریدا دەیبینێ‌و سەرجەم ئەو رووداوانە وابەستەی خوو سروشتی خەوبینەر دەکرێتەوە.

سێیەم/هەموو خەوێك بەسەر دوو تەوەرەی سەرەکیدا دابەشدەبێت بەشێکی باش‌و بەشێکی خراپ ، بەڵام ئەگەر خەونەکەی نەکەوت بەلایەکدا پێویستی بەبەڵگەیەك دەبێت یاخود خوێندنەوەی ناخی خەوبینەرو باری دەروونی.

چوارەم/ هەندێکجار خەو لەژێرکاریگەری رووداوەکانی رابردوودایە کەمرۆڤ ئەنجامیدەدات لەسوپاسگوزاری‌و گوێڕایەڵی‌و سەرپێچی ، یاخود دەقاودەق داهاتووی بۆ رۆشندەکاتەوەو خێروشەڕی بۆدەخاتەڕو لەرووداوەکانی ناڕەحەتی‌و شکۆمەندو نزمی باران‌و بێبارانی‌و وشکی.

پێنجەم/لەخەودا چارەنووسی مرۆڤ جیاوازە بەپێی هێڵ‌و سنوورەکانی خەو بۆ نموونە:

*دەگونجێت هەنار بۆ دەستەلاتدار ناوچەیەکبێت دەستەلاتداری وەربگرێ‌و توێکڵی هەنارەکەش دیوارو سنوورەکانی بێت‌و دەنکەکانیشی دانیشتوانەکەی بێت.

بەڵام بۆ بازرگان لانەو ماڵ‌و ئوتێل‌و ئوتومبیل‌و کەشتی‌و ماڵ‌و سامان‌و دوکان‌و گیرفانی پڕ لەدرهەم‌و دیناربێت.

هەروەها بۆ زانایەکی خواناس قورئانبێت‌و توێکڵەکەی لاپەڕەکان بێت‌و دەنکەکانی نووسینەکەی بێت، بۆ کەسێکی رەبەنیش هاوسەری ماڵ‌وساماندارێت، یان کیژێك بێت دوای مارەبڕینی تام‌و چێژو سوودی لێوەربگرێ.

هەر ئەو هەنارە بۆ ژنێکی دووگیان کیژێکبێت لەرەحمیدا.

دەگونجێت لەکاتی ژمێریاریی ماڵ‌و سامانبێت‌و گەنجینەی میری بێت‌و پارەی جۆراو جۆربێت بۆکارگوزارو فەرمانبەرانی میری.

شەشەم/ وردبوونەوە لەنموونەو ئەوپەندانەی بۆ خەڵکی دەهێنرێتەوە بەپێی چارەنووس و رەگەزجیاوازی، بۆنموونە ئەگەر دارو درەختبوو بەپێی رەگو لقو گەڵاکانی لێکدەدرێتەوە ئەگەر لاسکێکی هەبوو وەك کولەکەو هاوچەشنەکانی یان منداڵی فرێدراو.

حەوتەم/دەگونجێت مرۆڤ رووداوێك یان شتێك ببینیو لێکدانەوەکەی بگەڕێتەوە بۆ براکەی یان یەکانگیری خەوبینینی مەردوم لەگەڵ خەڵکیدا لەدوورەوە یەك بگرێتەوە *یەکەم/* ئەگەر لەرەچەڵەکدا چوونەوەسەریەك دایكو باوكو سەرچاوە ، *دووەم/*ئەگەر هاوپیشەو کرداریبوو.

خەونیش لەخاوەنەکەیەوە دەقاو دەق ناگوێزرێتەوە بۆ کەسێکیتر گەرماناو هێماکانی وابەستەی بەرانبەر نەکرێ، یاخود بەڵگەکان هاوتاو شایان نەبن لەگەڵی ، بۆنموونە: لەشساغ بێتو شەریکەکەی نەخۆشبێ ئەوکات نەخۆشی بەرانبەر نزیکترە لەمردنو گواستنەوەی بۆ ئەو جیهانە.

هەشتەم/راڤەکاری خەو دەبێت ژیرو شارەزابێت لەحاڵوباری خەڵکیو شێوەی هەڵسوکەوتو رەوشتیانو ، دەبێت ئاگاداربێت لەدەستەواژەکانی زستانو هاوینو شارەزای ئەم حاڵانەبێت:

١)کاتو وادەی بارانبارینو کاتێ دەبێت بەسوودو قازانج یان زیان.

٢)بوونی شارەزایی دەربارەی سەفەرکردن بەدەریادا.

٣)سروشتی ولاتانو تایبەتمەندی دانیشتوانەکەیو ئەوەی لەسەری دەچن بەرێوە.

٤)بوونی زانیاری دەربارەی حاڵوباری گونجاوو باش لەگەڵ خراپی هەریەك لە ئاسمانو رۆژو مانگو بارانو رەشەباو مزگەوتو...

نۆیەم/بەهەندگرتنی باری دەروونی خەوبینەران چونکە خەڵکی پێشین وتویانە: ئەوەی رەشبینیو غەمو پەژارە بەسەریا زاڵبوو رووداوەکان بەرەشیو تەڵخی

دەبینیٚ، بەپێچەوانەشەوە ، وێڕای ئەوەی خەو بەشێوەیەکی گشتی دەکریٚ بەسیٚ بەشەوە هەروەك لەفەرموودەیەکدا هاتوە: "خەو سیٚ بەشە: یا مژدەیە لەلایەن خوداوەندەوە، یاخود خەوێکە لەلایەن شەیتانەوە یان قسەو وتەی بێدارییەو بۆ مرۆڤ دەبێت بەخەو"[٨] .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "وادەی پێغەمبەرایەتی بەسەرچوو بەتەنیا مژدەی خۆش ماوە"[٩] .

هەندێکیش لەراڤەکارانی قورئان سەبارەت بەئایەتی : ﴿لَهُمُ الْبُشْرَىٰ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾(یونس:٦٤) وتویانە : کاتیٚ بەندە لەکڕنووشدا نووست خوداوەند دەفەرمویٚ: تەماشای بەندەکەم بکەن روحی لای منەو لەش‌ولاریشی لەبەندایەتیدایە.

هەروەها لە(ئەبی دەردا)ەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: "کاتیٚ بەندە چاولێکدەنیٚ‌و لەخەودا رۆدەچیٚ روحەکەی بەرەو ئاسمان بەرزدەکرێتەوە ئەگەر پاك‌و بێگەردبوو رێگەی دەدەن کڕنووش ببات ، ئەگەر وانەبوو رێگەی پێنادەن".

خەڵکیش سەبارەت بە(دەروون‌و روح)جیاوازن هەندێکدەڵێن یەك پێکهاتەن وەك نەفس‌و دەروون هەردووکیان لەنێو خوێندان‌و بەڵگەش لەسەری ئەوەیە کاتیٚ مەردومێك دەمریٚ خوێنی دەوەستیٚ[١٠] .

(ئیبن قوتەیبە)دەڵێت: مادام خەو بەپێی زانیاری‌و بنەماو شێوەکانی بەبوونی بەڵگەو نەبوونی جیاوازی هەیە تێیدا لەگەڵ بەهەندگرتنی سەردەم‌و رۆژگارو

---

[٨] (بوخاری) (٤٢٢/١٢)و(موسلیم) (١٧٧٣/٦/٤).

[٩] (ئیبن ماجە) (٣٨٩٦)و (دارمی) (٢١٣٨)و (ئەحمەد) لە(مسند)ەکەیدا (٣٧٦).

[١٠] لێرەدا(ئیبن سیرین) روو بەباسێکی بەدەر لەخەو دەچێت‌و بەباشمزانی بازبدەم بەسەریا. (وەرگێڕ).

کەش‌و باری خەوبینین‌و هێنانەوەی بەڵگەی قورئانی‌و فەرمودەو پەندو چیرۆك بۆیە پێم باشە چەند تیشکێ بخەمەسەر ئەو زانیارییەو روونی بکەمەوە...

لێکدانەوەی فەرمودە لەسۆنگەی واتای ناوەکانەوە رووکەشی دەستەواژەکە هەڵێدەگرێ‌و وەك ئەوەی پیاوێك ناوی (چاکەیە) لەخەودا بەخێروچاکە لێکدەدرێتەوە، یاخود پیاوێك ناوی (رێنما)یەو لەخەودا بەرێنومایی راڤەدەکرێت، یان ژنێك ناوی (ئاشتی)یەو بەپارێزراویی‌و سەلامەتی لێکدەدرێتەوەو چەندین نموونەی تریش.

هەروەها لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: "لەخەودا بینیم لەماڵی (عوقبە)ی کوڕی (رافع) بووین‌و خورمای تەڕی باشیان بۆ هێناین[11] بەوە لێکمدایەوە کەوا بەرزی‌و بڵندی‌و شکۆ لەدنیاو قیامەتدا بۆ ئێمەدەبێ‌و ئاینەکەشمان باش‌و شیریندەبێ".

لە(شریك)ی کوڕی (ئەبی شمر)ەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: "لەخەودا بینیم ددانەکانم کەوتن، سەبارەت بەوە پرسیارم لە(سەعید)ی کوڕی (مسیب)کردو وتی: ئایا زەرەری پێگەیاندی؟! ئەگەر خەونەکەت بەوشێوەیەبێت‌و هەمووددانەکانت کەوتبن خزم‌و خانەوادەکەت لەمردنیاندا پێش تۆدەکەون‌و کەسیان نامێنێ.

لێرەدا (سەعید) خەوەکەی بەپێی دەستەواژە لێکدایەوە چونکە (ددان) لەخەودا پەیوەندی خزمایەتییە.

هەروەها لە(بشر)ی کوڕی (ئەبی عالیە)ەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: لە(محەمەد)م پرسی دەربارەی پیاوێك لەخەودا ببینێ هەموو ددانی کەوتبێت، ئەویش لەوەڵامدا وتی: ئەو پیاوە پەیوەندی خزمایەتی بچڕاندوە، لێرەدا خەونەکە بەپێی بناغەی خۆی لێکدەدرێتەوە نەك بەپێی دەستەواژە.

---

[11] (موسلیم)(٤/١٨/١٧٧٩)و (ئەبوداود)(٥٠٢٥)و (ئەحمەد) (٣/٢١٣).

لە(ئەسمەعی)ەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: پیاوێك زەوییەکی کڕیو بینی برازاکەی بەنێویدا دەڕوات بەلاّم هیچ هەنگاوێك هەڵناگرێت مەگەر بەسەری مارێکدا نەبێت ، ئەویش وتی: ئەگەر خەوەکەت بەو چەشنەبێت لەو زەوییەدا هەرشتێك بڕوێنرێ بەباشی نەشو نمادەکات.

هەروەها دەڵێت: ئەگەر ناوێك لەچەند پیتێکی زیادە پێکهاتبوو لەخەودا بەرەچەڵەکناس یان دەروونناس دادەنرێ وەك (بەهیّ) ئەگەر بینیو لەخەونەکەیدا نیشانەیەکی تێدانەبوو بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی بەسەفەر لێکدەدرێتەوە، هەروەها (گوڵەشلێر) بەرووکەش وەردەگیرێو بەخراپ راڤەدەکرێ بەشێکی هەی ناوەکەیەتی چونکە (سوسن) لەعەرەبیدا بەخراپ لێکدەدرێتەوە.

لێکدانەوەش بەمانا بەزۆری بەکارهاتوە وەك (لالەنگی) ئەگەر ماڵو سامانو منداڵنەبوو بەدووڕوویی لێکدەدرێتەوە بەهۆی جیاوازی دەروناواخنی.

راڤەکردنیش بەپەندو ئەو دەستەواژانەی لەسەر زوبانن رێبازێکی دیکەیە راڤەکارانی خەو پیادەی دەکەن وەك ئەوەی بەزەڕەنگەر دەڵێن: پیاوێکی درۆزن بەهۆی وتەی سەرزاری خەڵکی سەبارەت بەوشەی (صوغ)ەوە کەبەهەڵبەستنی وتەوقسە هاتوە. هەروەها وتەیان دەربارەی یەکێك ببینێ دەستی درێژبوە بەچاکەکار راڤەیانکردوە ئەمەش لەپەندێکەوە هاتوە کاتێ دەوترێ: "فلان دەستڕۆیشتوترە لەتۆ...".

پێغەمبەری خوا(ﷺ)بەهاوسەرانی دەفەرموێت: "خێردارترینتان کەزوو دەگاتە لام دەستدرێژترینتانە"[١٢].

خاتوو (زەینەب)ی کچی (جەحش) لەپێش هەموویانەوە مردو ئەم خاتوونە دەستگیرۆیی هەژارانیدەکردو تێکۆشەرانی ئامادەدەکردو مەبەستەکەی پێغەمبەریش(ﷺ) خێرومەندییوو لەدەستدرێژترینیان، هەروەها راڤەکردن

---

[١٢] (موسلیم) (٨/١٠١/٢٤٥٢)(نووی).

نەخۆشی بەدووڕوویی چونکە لەلای خەڵکی کەسی بێ وادەیان بەنەخۆش لێکداوەتەوە ، خوداوەند دەفەرموێت: ﴿فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضاً وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ (البقرة:١٠)

ئەم نەخۆشییە مەبەست پێی نەخۆشی دووڕووییە.

هەروەها لێکدانەوەیان بۆ چڵم بەکوڕیانداناوە چونکە دەربارەی ئەو منداڵەی لەباوکی دەچێت وتویانە: "وەك چڵمی باوکی وایە".

هەروەها وتەیان سەبارەت بەوەی رمو تیرو بەرد دەگرێتە خەڵکی یان بەوەلێکیانداوەتەوە غەیبەتە باسیاندەکاتو خوداوەند دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ﴾(النور: ٤)و ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ﴾(النور:٦).

هەروەها لێکدانەوەیان سەبارەت بەیەکێك ئەندامێکی ببڕێت: سەفەر دەکات لەهۆزو خانەوادەو ماڵو منداڵو وڵاتی دووردەکەوێتەوە کەئەمەشیان لەبڕینی ماوەی وڵاتەوە هێناوە وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾(سبأ: ١٩)و ئایەتی ﴿وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الْأَرْضِ أُمَماً مِنْهُمْ﴾(الأعراف :١٦٨).

هەروەها لێکدانەوەیان دەربارەی کوللە: لەهەندێك بارودۆخدا "قاوقیژکارە"...وتەیان دەربارەی ئەوەی دەستی دەشوات بەقەوزەو نائومێدییەتی لەوەی داواخوازیەتی بەهۆی وتەی خەڵکیەوە کاتێ نائومێد دەبن لەکەسێك دەڵێن: دەستمان لێشتوە ...

هەروەها وتەیان سەبارەت بەبەران: پیاوێکی بەڕێزی پارێزراوە ، هەروەها وتەیان دەربارەی هەڵۆو باز : پیاوێکی ئازاو بەزەبرە.

سەبارەت بەلێکدانەوەش بەپێچەوانەو واژووە وەك:

١ـ گریان شادیو خۆشییە.

٢ـ پێکەنین غەمو پەژارەیە.

٣ـ دووپیاوی ناكۆك یاخود رۆژو مانگ بەربەرەكانی بكەن سەركەوتن بۆ دۆڕاوەو زۆرانبازیش شكست بەدەستدەهێنێ.

٤ـ كەڵەشاخگرتن چەكو مەرج دانانە.

٥ـ چەكنووسیش كەڵەشاخ گرتنە.

٦ـ تاعون جەنگەو بەپێچەوانەوە.

٧ـ لێشاوو لافاو دوژمنەو بەپێچەوانەشەوە.

٨ـ خواردنی هەنجیر پەشیمانییەو بەپێچەوانەشەوە.

٩ـ ئەوەی دەمرێ بەلاّم رێورەسمەكانی مردووی بۆ پیادەناكرێ لەشتنو كفنو ئەسپەردەكردن یاخود گریانو شیوەن ئەوكەسە بەشێكی لانەوماڵەكەی دەڕووخێ.

١٠ـ كوللەیان بەسەرباز داناوەو بەپێچەوانەشەوە.

هەروەها هەندێكجار راڤەی خەویان بەكەمو زیاد كردوە وەك:

١ـ گریانو شیوەنیان لەخەودا بەخۆشیو شادی لێكداوەتەوە بەلاّم ئەگەر دەنگو ئاوازی لەگەڵدابوو بەلاّو نەهامەتییە، پێكەنینیشیان بەغەمو پەژارە لێكداوەتەوە بەلاّم ئەگە بزەو خەندەی لەگەڵبوو باشە.

٢ـ لێكدانەوەیان بۆ گوێرەكە ماڵێكی پارێزراوی شاراوەیە ئەگەر تەقەتەقی لەگەڵبوو دەنگەدەنگو بەربەرەكانییە.

٣ـ لێكدانەوەیان بۆ رۆن ئەگەر بەئەندازەیەك لێی بڕا جوانیو رازاوەییە ، ئەگەر لەدەموچاوو رووخساری چۆڕا غەمو پەژارەیە، ئەگەر بەسەرەوە زۆربوو رووپامایی سەرۆكو بەرپرسە بالاّكانە.

٤ـ لێكدانەوەیان سەبارەت بە(زافەران) گوایە پیاهەڵدانی باشە بەلاّم ئەگەر چوو لەجلوبەرگو لاشەوە دەبێت بەغەمو پەژارە.

٥ـ (لێدان)یان بەپۆشاكو داپۆشین لێكداوەتەوە ، بەلاّم ئەگەر كاتێ لێیدراو دەمو چاوی بەسترابوو پیاهەڵدانو ستایشی باشەو ناتوانێ لەخۆی دووریبخاتەوە.

٦ـ ئەگەر خەوبینەرێك بینی پەڕی هەیە خێرو باشەیە بۆی‌و ئەگەر بەباڵەکانی فڕی بەئەندازەی بەرزبوونەوەی لەزەوی دووردەکەوێتەوە.

٧ـ ئەگەر بینی دەستی بڕاوەو بەخۆیەتی بڕاو کوڕێکی باشیدەبێت ، بەلاّم ئەگەر دەستەکەی لێی جیابوەوە کەوت بەلاّو نەهامەتی روودەکاتە براو کوڕەکەی.

٨ـ ئەگەر نەخۆشێك بینی لەشساغەو لەماڵەکەی دەچێتەدەرەوەو هیچ گوتارێك لەزاری نایەتە دەرەوە دەمرێ بەلاّم ئەگەر دواو قسەیکرد چاکدەبێتەوە.

٩ـ مشکیان بەژنان لێکداوەتەوە بەمەرجێك رەنگی جیاواز نەبێت ، ئەگەر سپی‌و رەشبوو شەووڕۆژە.

١٠ـ سەبارەت بە(ماسی) ئەگەر ژمارەکەی دیاریکراوبوو بەژن لێکیانداوەتەوە ، ئەگەر زۆربوو ماڵ‌و سامان‌و دەستکەوتە.

هەروەها (کات)بەهەندگیاوە لەلێکدانەوەی خەودا ، بۆنموونە:

(١)لێکدراوەتەوە بۆ یەکێك کەسواری (فیل) دەبێت بەکارێکی مەزن‌و کاریگەر بەلاّم سوودو قازانجی کەمە، ئەگەر لەرۆژدا ئەوەی بینی ژنەکەی تەلاّقدەدات یاخود بەهۆی هاوسەرەکەیەوە زیانی پێدەگات ، هەروەها مریشکی کڕکەوتوویان بەمرۆڤێکی کەودەتی پیس‌و گەندەڵ لێکداوەتەوە.

(٢)راسترین خەو خەوی بەرەبەیان، چێشتەنگاوو باشترین کاتیش بۆ خەو کاتی پێگەیشتنی بەروبوومەو لاوازترین کاتیش زستانە.

(٣)خەوی رۆژ بەهێزترە لەهی شەو.

(٤)خەو بۆ خەڵکی چوونیەك نییەو جیاوازی هەیە بۆ هەندێك باشەو بۆ هەندێکیتر خراپ‌و ناقۆڵایە.

## لەرووداوە سەیرەکانی نێو خەو:

بەلاّو نەهامەتی یان خێرێك روودەکاتە مرۆڤێك لەخەوەکەیداو لەکاتی بێداریدا وەك خۆی رووداوەکە دێتە دی.

دەگێڕنەوە (عومەر)ی کوڕی (خەتتاب) (ﷺ)دادوەرێك دەنێرێت بۆ (شام)و پاش چەند رۆژێك بەڕێوەبوون دەگەڕێتەوەو (عومەر) سەبارەت بەهۆی گەڕانەوەی دەپرسێت ، ئەویش دەڵێت: لەخەودا بینیم رۆژو مانگ دەجەنگن لەگەڵ یەكو ئەستێرەكانیش دابەشبوون بەسەر رۆژومانگدا، (عومەر) لێی پرسی: تۆ لەگەڵ كامیان بووی؟ وتی : لەگەڵ مانگ. ئنجا پێی وت: ئازادبەو چیتر كارم بۆ ئەنجام مەدە ، پاشان ئایەتی: ﴿ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً ﴾(الاسراء: ١٢)خوێندەوە ، پاشان دوای سەردەمی (عومەر)و (عوسمان) رووداوی (صفین) روویداو ئەوپیاوە كە(جابر)ی كوڕی (سەعید)ی (طائي)بوو لەگەڵ گروهی شامدا كوژرا.

(ئیسحاق)ی كوڕی (ئیبراهیم)ی موسڵی دەڵێت: لەلای (یەزید) ی كوڕی (مزید)بووم وتی: خەوێكی سەرسوڕهێنەرم بینی ، پاشان داوایكرد راڤەكارێكی خەوی بۆ بهێنن ، ئنجا خەوەكەی گێڕایەوەو وتی: باڵندەیەكم گرتو ویستم سەریببڕمو چەقۆكەم سێجار لەگەردنی توندكرد هەڵدەگەڕایەوە تاجاری چوارەم سەرمبڕی، پێیان وت: خەوێكی باشت دیوە ، كچێك دەهێنیتو لەجاری چوارەمدا لەگەڵیدا جووتدەبی...

(ئیبن قوتەیبە) دەڵێت: دەبێت راڤەكاری خەو رابوەستێ لەسەرئەوەی كەدێتە لای و دەستبەرداری زۆر لەخۆكردن ببێتو با ئەوەی لێی تێكەڵو ئاڵۆزدەبێت خێرا بەرپەرچی نەداتەوە.

(ئەسمەعی) لە(ئەبی میقدام( یان (قورە)ی كوڕی (خالید)ەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: زۆرجار ئامادەی كۆڕو دانیشتنی (ئیبن سیرین) دەبوومو لە(چل) خەو یەكێكی لێكدەدایەوە.

(ئیبن قوتەیبە) دەڵێت: لەوتەوقسەكانی خەوبینەر حاڵیببە پاشان بەپێی بنەماكانی خەو راڤەی بكە، ئەگەر قسەكانی راستو دروستبوو هاومانای هەبوو

داوابکە خوداوەند ڕێنمونیت بکات بۆ لێکدانەوەو راڤەکردنی، ئەگەر خەونەکە دوومانای واژووی یەکدی هەڵگرتبوو نزیکەکەیان لەبنەماکانەوە بگرەبەر ، بەلآم لەکاتی نەگونجانیدا لەگەڵ بنەماکانیدا دەستبەرداری زیادەو تێکەڵو پێکەڵی ببەو ئەوەی لەگەڵ بنەمادا دەگونجێت وەریبگرە.

ئەگەر سەراپای خەونەکەش تێکەڵو ئاڵۆزبوو لەهیچ روویەکەوە نەدەگونجا لەگەڵ بنەماکان بێدەنگبەو لێکی مەدەرەوە.

ئەگەر خەونەکە بەڵگەبوو لەسەر خراپەو کاری ناڕەوا دەبێت باسینەکەیتو دەستەواژەکانی لێکنەدەیتەوە.

هەروەها دەبێت لەخەودا سێ حاڵ بەهەند بیگریّ:

**یەکەم/رەگەز:** وەك دارو درەختو ئاژەڵو درندەو باڵندە.

**دووەم/ پۆل( جۆر):** جۆری دارو درەختێك لەیەکێکیتر جیابکاتەوە یان درندەیەك لەیەکێکیتر ، یاخود باڵندەکان پۆلێن بکات، بۆنموونە: ئەگەر دارخورمابوو بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی عەرەب، ئەگەر باڵندەکەش (تاوس) بوو بەڵگەیە لەسەر عەجەمییەك.

**سێیەم/سروشت:** دەبێت لەسروشتی ئەودارو باڵندەیە بکۆڵرێتەوە ئەوجا بەراوردبکریّ لەگەڵ خەوبینەردا، ئەگەر (دارخورما)بوو ئەو پیاوە بەکەسێکی سوودمەند لێکدەدرێتەوەو لەوبارەیەشەوە خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ ﴾(ابراهيم:٢٤) مەبەستی دارخورمایە.

ئەگەر باڵندەبوو دەبێت بزانێت خەوبینەر خولیای سەفەروگەڕانە، ئەگەر قەلەڕەشبوو دەستەلآتدارێکی ستەمکاری یاخییە.

هەروەها دەبێت خەوبینەر بەدووی راستگۆیدا بگەڕیّو رووداوو کارەساتێك تێکەڵنەکات بەسەر یەکداو لەلای پەروەردگاریش بەتاوانبار بناسرێت.

لە(عەلی) کوڕی (ئەبی تالیب)ەوە (ﷺ) دەگێڕنەوەوتویەتی: "کەسی ترساو خەونی نییە مەگەر ئەوەی خۆی پێی خۆشبێت" لێرەدا دەروو لەخەوبینەر دەکرێتەوەو ترس‌و بیمەکەی دەڕەوێتەوە.

مەردومی وا هەیە (زەمیلە)خورما بەدەستدەهێنیێ‌و سەد درهەمی دەستدەکەوێ مەردومی دیکەش هەیە زەمیلە هەڵدەگرێ‌و پتر خێردەکات لەوبڕە یاخود تام‌و چێژ لەئاینەکەی دەبینێ.

راسترین خەو خەوی دەستەڵاتدارە یاخود کەسێکی زەبوون‌و چەوساوە، دەگونجێت شوێن‌و جێگەیەك لەگەڵ سروشتی مرۆڤێکدا نەگونجێ‌و یاخود ماڵ‌و لانەو جێگەو پیاوو ژن‌و باڵندەو زیندەوەرێك کەوا تاقیکرابێتەوەو یان ئالوودەی بێت‌و بەبینینی غەم‌و پەژارە رووی تێبکات یاخود بەلاّو نەهامەتی‌و چەرمەسەری، دەگونجێت ئەوەی لێی دواین هەماهەنگ بێت لەگەڵ سروشتی مرۆڤداو بەخێر بگەڕێتەوە بۆی.

لەسۆنگەیەکی دییەوە دەگونجێت مرۆڤ راستگۆبێت لەگوفتارداو خەونەکەی راستبێت‌و بەپێچەوانەشەوە ، خەوی ئەویش بەهێزترە لەخەوی رۆژو راسترین کاتیش بەرلەنوێژی بەیانییە.

دەبێت راڤەکاری خەو ئێجگار وریابێت ، نابێت خەو لەبنەماو رێساکانی لابدات‌و بەدرۆو ئارەزووی خۆی لێکی بداتەوەو لەکاتێکدا نەیزانی بێدەنگی باشترین هەڵوێستە بۆی.

ئەگەر رووداوێکی ناخۆی بینی لەخەودا کاتێ بەئاگاهات (ئایەتولکورسی) بخوێنێ ، پاشان تفێك بکات بەلای چەپداو بڵێ: "پەنادەگرم بەپەروەردگاری (موسا)و (عیسا)و ئیبراهیم)ی بەئەمەك‌و (محەمەد مستەفا) لەشەڕو خراپەی ئەو خەوە کەوا شەڕو خراپەم لەئاین‌و دنیاو بژێویدا پێبگەیەنێ بڵندبێ ستایشی ئەو پەروەردگارە".

ئەگەر خەو لەکاتی بەرگرتنی داروودرەختدابوو باشەو لەکاتی پێگەیشتنی بەروبوومدا باشترەو راستو دروستی لەبارو شایانترە، بەڵام ئەگەر گەڵای دارەکان کەوتبوون خەونەکە لاوازو تێکەڵو ئاڵۆزە.

ئەو نهێنیو کەموکوڕیانەشی مەردوم دەربارەی موسوڵمانان دەیبینێ دەبێت بیشارێتەوەو باسینەکاتو لای نزیکترین کەسیش نەدرکێنێو، نابێت راوبۆچوونی خۆی لەسۆنگەی ئەو خەونەوە دەربارەی ئەوکەسە دەربڕێ چونکە لەوبارەدا روو بەوەڵامدانەوەی وەسوەسەکانی شەیتان دەچێت.

هەروەها لە (ئیبن سیرین)ەوە دەگێڕنەوە ئەگەر خەوێکیان بۆ گێڕابێتەوە بەدرێژایی رۆژ پرسیاریکردوە لەخەوبینەر دەربارەی حاڵو باریو بژێویو بینینیو هیچ کەلێنو بوارێکی فەرامۆش نەکردوە بەڵگەو نیشانەی تێدابووبێت پرسیار لەخەوبینەر نەکات.

**هەروەها پێویستە راڤەکاری خەو سێجۆر زانیاری بزانێت:**

١)لەبەرکردنو شارەزابوون لەبنەماکانداو جیاوازیو هێزو لاوازی لەخێروشەڕدا، هەتا کێشی لێکدانەوە بزانێت ، ئەمەش لەبڕیاردانو هەڵبژاردندا لەگەڵ بەهێزکردنی راکانی بەنیشانەو بەڵگە، پاش بەراوردکردنی لەدەروونـدا ئەوجا دەدوێت سەبارەت بەخەونی باسکراو.

٢)گونجاندنی بنەماکانی خەو لێکدانەوە لەگەڵ یەکدا هەتا وتەیەکی دروستو راست لەمیانەی ئەو بنەمایانەوە دەربهێنێو خەوی تێکەڵو ئاڵۆزو شەیتانـاوی جیابکاتەوە نەدوێت لەسەری.

٣)پێداگرتن لەسەر باسو خواسەکانی خەوو دروستیو راستی مەسەلەکانو ئەو خەوەی بۆیدەگێڕنەوە بۆئەوەی بتوانێت بگات بەلێکدانەوەی دروست.

ئەگەر ویستت خەوێکت بۆ روون ببێتەوە باسو خواسەکانی (ئیبن سیرین)و راڤەکارانی خەوبهێنەو راستەوخۆ هەرگیز لێکینەدەیتەوە، بۆنموونە: لە(ئیبن

سیرین)ەوە دەگێڕنەوە ژنێك دێتە لای و دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی کوت و بەندکراوم بینی ، (ئیبن سیرین)یش دەڵێت : شتی وا نابێت چونکە بەندگیر باوەڕو ئاینەو کۆتیش بێباوەڕوی ناپاکییە ئیدی چۆن باوەڕو ناپاکی بەیەکەوە یەکانگیردەبن؟! ژنەکەش سوێندی بۆ دەخوات کەئەو خەوەی لەحاڵێکی باشدا بینوەو کاتێ تەماشای پێوەندەکەی گەردنی کردوە کەلە گەردنیدابوە لێرە ژنەکە باسی پێوەند دەکات و (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئێستا زانیم پێوەندەکە لە تەختەبوەو تەختەش دووڕوویییە لەئایندا هەروەك پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ﴾(المنافقون: ٤)

بەم پێودانگە هەموو باس و خواسێکی نێو خەو ئەگەر نیشانەو هێمایەك یاخود زیاتری تێدابوو بەهێزترە لەلێکدانەوەی خەودا هەروەك چۆن پەروەردگار باس لەخەونی شای (میسر) دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ إِنِّي أَرَى سَبْعَ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ﴾(یوسف: ٤٣) مانگای قەڵەو سالّی پڕو فەڕوپیتەو لاوازیش سالّی قات و قڕییە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَسَبْعَ سُنْبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ﴾(یوسف:٤٣) ئەمەش سالاّنی ناوزەدکراوە لەمانگاکاندا بەلاّم بوون بەدوو بەڵگە بۆ چەسپاندنی سالاّن لەمانگاکاندا.

هەموو زانیارییەکی دانایی و هاوچەشنەکانی لەبیرکاری و عەرەبی و فەلسەفەو فەرزو.سوودی لێوەردەگیرێ لەلێکدانەوەی خەودا.

سەرباری ئەوە دەبێت بزانرێت بنەماکانی خەو هیچ گۆڕانکارییەکیان بەسەردا نەهاتوە بەلاّم ئەوەی گۆڕانکاری بەسەرداهاتوە حاڵ و باری خەڵکی و ڕەوشت و پەروەردەو شێوازی ژیانیانە، چونکە خەڵکی لەم ڕۆژگارەدا سەرجەم هەوڵ و تێکۆشانیان لەپێناوی تێکردنی حەزو ئارەزووەکانیاندایە بەدەر لەدنیانەویستی و ویست و خوازە بالاّکان.

یارانی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ خورمایان دەبینی بەتامو چێژی ئاینەکەیان لێکدەدایەوەو هەنگوینیان بە خوێندنەوەی قورئانو بەدەستهێنانی زانیاری ، ئەو تامو چێژەبوو بەخولیای رۆژانەیانو لەنێو سەرجەم خەڵکیدا بلاوبوەوە، زۆرجاریش بێباوەڕو یاخیبوان خەونی راست دەبینن و بەچەسپاندنی بەڵگەی خوایی بەسەریاندا کۆتایی دێت وەك چۆن پادشای( میسر) خەوێکی بینیو هاتەدیو، بە(بختنصر)یش خەوێکی بینیو موڵكو دەستەلاتی تیاچوو کاتێ (دانیال)ی دانا بۆی لێکدایەوەو، (کیسرا)ش تیاچوونی موڵكو دەستەلاتی بەخەوبینی، بۆیە دەبێت بزانرێ ئەمە هێڵێکی گشتییە بۆ ئەو زانیارییەو چۆنییەتی رێنومایی و فێربوونی.

# بەناوی پەروەردگاری مەزن و بێپایان*

سوپاسو ستایش بۆ خوداوەندو مەزنی جیهانیان

پاشان..

(ئەبوسەعیدی واعیز) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: مادام خەوی راستو دروست لەراستی کردارەکانەوە سەریگرتوەو وریاکەرەوەیە بۆ کردارەکانو مژدەو ئاگاداری هەڵگرتوەو پاشماوەی پێغەمبەرانەو یەکێکە لەو دووبەشەی پێغەمبەرایەتیو هەندێك لەپێغەمبەران نیگایان بەشێوەی خەوبوەو هەندێکیش بەشێوەی ناردنی فریشتەی پەیامبەر بۆیە واپێویستدەکات گرنگی پێبدرێت.

(محەمەدی کوڕی سیرین) لە(ئەبی هورەیرە)ەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: "کاتێ دنیا نزیك بەدوایهاتنی بووە خەوی موسوڵمان تێکەڵدەبێتو راسترینیان لەخەودا ئەوەیە راستگۆیە لەوتەدا، خەوی باوەڕداریش بەشێکە لەچل بەشی پێغەمبەرایەتی، خەویش سێ بەشە:

---

* ئەم پێشەکییەش خستویانەتە پاڵ (ئیبن سیرین)و وەك خۆی وەرمگێڕا لەگەڵ هەندێك دەستکاریدا لەهەندێك شوێنو جێگەدا. (وەرگێڕ)

١/خەوێك كەمژدەی هەڵگرتوەو لەلایەن خوداوەندەوە.

٢/خەوێك كەموسوڵمان دەیخاتە دڵو دەروونی.

٣/خەوێکی غەمو پەژارەدار شەیتان بۆ مرۆڤی دروستدەکات.

ئەگەر خەوێکتان بینی خەشمو قینتان پێی هەڵدەستا باسی مەکەنو کاتێ هەستان نوێژ بکەن" [1].

هەروەها فەرموویەتی: "بەندیم پێخۆشەو خەشم لەکۆتە" [2].

هەروەها خاتوو(عائشە)(ڕەزای خوای لێبێت) لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: "لەدوای من پێغەمبەرایەتی نامێنێت جگە لەمژدەنەبێت ، یارانیش پرسیان مژدەچییە؟ فەرمووی: خەوی خۆش دەیبینێ یاخودنیشانی دەدەن" [3].

هەروەها (عبادە)ی کوڕی (صامت)دەفەرموێت: پرسیارم لەپێغەمبەری خواکرد سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ، لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ﴾(يونس: ٦٣ـ ٦٤).

پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: "پرسیارت لێکردم دەربارەی باسێك هیچکەس بەدەر لەتۆ پرسیاری نەکردوە ئەوە خەوی باشە مرۆڤ دەیبینێ یاخود نیشانیدەدەن" [4].

کوڕەکەی (ثابت)ی کوڕی (قەیس) (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت: کاتێ ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ﴾(الحجرات: ٢)دابەزی (ثابت)ی باوکم چوە نێو ماڵی خۆیو دەرگای داخستو بەتوندی دەستیکرد بەگریان ، پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پرسیو پاشان ناردی بەدوایداو لێی

---

[1] (بوخاری) ژمارەی فەرمووده: (٧٠١٧) ، و(مسلم) (١٧٧٣/٦/٤).

[2] (بوخاری) (٧٠١٧)، (مسلم) (١٧٧٣/٦/٤).

[3] (مسلم)(٢٠٧/٢/٤٣٤)نووی) ، (ئەبوداود) (٨٧٦) و(ئیبن ماجە) (٣٨٩٩) و(اسناد)ەکەی (صحیح)ە.

[4] (ترمذی)(٢٢٧٥)و (ئبن ماجە) (٣٨٩٨) و(ئەحمەد) (٢٢١٧٩) (دارمی) (٣١٣٦).

پرسی سەبارەت بەو حاڵەی تێیکەوتوە، ئەویش وتی: من پیاوێکی دەنگبەرزم دەترسم کردارەکانم پووچ و بەتاڵبوبنەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "تۆلەوان نییت بەباشی دەژیت و بەباشیش دەمریت"[٥].

پاشان ئایەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾(لقمان: ١٨)دابەزیو دیسان (ثابت) دەرگای لەسەر خۆی توندکردو دەستیکردەوە بەگریان و کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پرسی و بانگیکردو وتی: من پیاوێکم حەزم لەجوانییەو ئارەزووی سەرۆکایەتی خزم و کەسەکانمدەکەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ لەوانە نیت و بەباشی دەژیت و بەشەهیدی دەمریت و خوداوەندیش دەتخاتە بەهەشتەوە"[٦].

دوای تێپەڕوونی ئەو رۆژگارە رووداوی (یەمامە)هاتەپێش و (ثابت)لەگەڵ (خالید)ی کوڕی (وەلید)چوو بۆ روو بەڕووبوونەوەی (موسەیلەمە)ی درۆزن و کاتێ بەیەك گەیشتن لەیەکتر ئاشکرابوون (ثابت)و (سالم)ی خزمەتکاری(ئەبو حوزەیفە) وتیان: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بەو چەشنە نەدەجەنگاین، ئنجا هەریەکێکیان چاڵێکی هەڵکەندو خۆیان تێهاویشت و بەجێگری مانەوە هەتا کوژران لەو رۆژەشدا (ثابت)قەڵغانێکی گرانبەهای پێوەبوو، موسوڵمانێك بەلایدا تێپەڕی و قەڵغانەکەی برد، لەوکاتەدا پیاوێك لەموسوڵمانان نوستبوو (قەیس)ی کوڕی (ثابت) هاتە خەوی و وتی: ئامۆژگارتدەکەم نەڵێیت ئەمە خەوەو لەبیری بکەی، دوێنێ کەکوژرام یەکێك لەموسوڵمانەکان قەڵغانەکەی بردمماڵەکەی لەهەرە سەرووی ماڵی خەڵکیەوەیەو خاوەن ئەسپێکی ئێجگار درێژەو قەڵغانەکەشی لەژێر بەرمیلێك داناوە پیاوێك لەسەری دانیشتوە، بە(خالد) بڵێ و قەڵغانەکەی لێوەربگرنەوەو، کاتێ گەڕانەوە بۆ (مەدینە) بەخەلیفەی پێغەمبەر

---

[٥] (قورتوبی) لە(تەفسیر)ەکەیدا هێناویەتی (٢٩١/١٦).

[٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(ﷺ) رابگەیەنن ئەوەندە قەرزارم هی فلان‌و فلانە، ئنجا پیاوەکە بەئاگاهات‌و خەوەکەی بۆ (خالید) گێڕایەوەو ئەویش قەڵغانەکەی هێناو بە(ئەبوبەکر)ی راگەیاندو وەسیەتەکەی جێبەجێکراو هیچ کەسیشمان نەدەناسی وەسیەتی جێبەجێکرابێ دوای مردنی لە(ثابت)ی کوڕی (قەیس) زیاتر.

(ئەبوسەعد) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ئەو هەواڵ‌و باسانەی گێڕاومانەتەوەو لەخودی خۆیاندا راست‌و شوێنەواریان بەجێهێشتوە، یەکەم خەویش لەسەر زەویدا بینرابێت خەوەکەی (ئادەم)ە(سەلامی خوای لێبێت) لە(وهب)ی کوڕی (منبە)ەوە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕنەوە دەڵێت: خوداوەند نیگای نارد بۆ (ئادەم) (سەلامی خوای لێبێت) تەماشای دروستکراوانت کردوم ئاخۆ هاوچەشنی خۆت تێدابینیوون؟ ئەویش دەڵێت: نەخێر ئەی پەروەردگارم بەراستی تۆ رێزدارتکردم‌و بەمەزنتگێڕاوم بۆیە داواکارم هاوسەرێکم بۆ دروستبکەی لەخۆم بچێ هەتا ئارام‌و هێمن بین‌و هەردووکمان پەرستش بکەین، خوداوەندیش پێی فەرموو: باشە، ئنجا خەوی لێخست‌و (حەوا)ی لەسەر شێوەی خۆی دروستکردو بەخەویش نیشانیدا (ئەمەش یەکەم خەوبوو لەسەر زەویدا) کاتێ بەئاگا هات (حەوا)ی لەژوورسەری خۆیەوە بینی، خوداوەند لێی پرسی: ئەوەی لەژوور سەرت دانیشتوە کێیە؟ وتی: ئەو خەونەیە کەنیشانتدام.

هەروەها ئەوەی بەڵگەیە لەسەر هاتنەدی خەو حەزرەتی (ئیبراهیم) (سەلامی خوای لێبێت) لەخەودا دەبینێ کوڕەکەی سەردەبڕێ، کاتێ بەئاگادێت هەمان فەرمانی کرداری نێو خەوەکەی دەدرێ بەسەردا، پەروەردگار لەسەر زاری (ئیبراهیم)ەوە دەفەرموێت: ﴿يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانْظُرْ مَاذَا تَرَى قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾(الصافات:١٠٢).

کاتێ (ئیبراهیم) (سەلامی خوای لەسەربێت) بەخەونەکەیزانیو کۆشا بۆ بەجێهێنانی خوداوەند بەمیهرو سۆزی خۆی دەرووی خێری لێکردەوە بەرانێکی بۆناردو کردی بەقوربانی.

هەروەها خەوەکەی حەزرەتی(یوسف) (سەلامی خوای لێبێت) هەروەك (وهب)ی کوڕی (منب) بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: "یوسفی کوڕی یەعقوب "کاتێ مندالبوو خەوێکی بینی کەلەمالی یەکێك لەبراکانیدا نوستبوو بینی هەریەك لەبراکانی گۆچانێکی ئەستووریان بەدەستەوەیەو شوانی پێدەکەنو پێوەی دەچن بەرێوەو گیانداری دڕندەی پێدەکوژن، بەلاّم (یوسف) خۆی دارێکی بارێکی پێبوو خۆیدەدا بەسەریاو ئاژەلەکانی پێلێدەخوریو گیانداری دڕندەی پێدەکوشتو لەهەمانکاتیشدا یاری پێدەکرد لەگەلّ مندالانی دیکەی هاوتەمەنی خۆی، کاتێ لەخەوەکەی بەئاگاهات بەبراکانی وت: خەوێکم دیوە بۆتان باسبکەم ؟ وتیان: بەلێ بۆمانبگێڕەرەوە، ئەویش وتی: من ئەودارەی خۆم بینی لەزەویدا رواو پاشان سەرجەم دارەکانی ئێوەهێنراو لەدەوری دارەکەی من چەقێنرا، گەرچی دارەکەی من لەهەموو دارەکانی ئێوە بچووکتربوو بەلاّم دارەکەی من بەرزبوەوە رەگی لەزەوی داکوتاو، ئنجا لەژێرەوە دارەکانی ئێوەی تەوقداو دارەکانی ئێوە لەدەوری دارەکەی من جێگیربوو، کاتێ ئەم خەوەیان لە(یوسف) بیست وتیان: کوڕەکەی (راحیل) هەرئەوەی ماوە بلێ: ئێوە هەمووتان کۆیلەی منو منیش گەورەتانم، دوای بینی ئەو خەونە حەوت سالّ تێپەڕیو ئنجا لەخەودا بینی ئەستێرەکانو رۆژو مانگ کڕنووشی بۆ دەبەنو بۆ باوکی گێڕایەوە : ﴿إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَباً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ﴾(یوسف: ٤)

(یەعقوب)(سەلامی خوای لێبێت) راڤەو لێکدانەوەی خەوەکەی دەزانی ترسا براکانی ئیرەیی پێببەن چونکە مانگ باوکیبوو رۆژیش دایکیو ئەستێرەکانیش براکانی بۆیە لەترسا وتی: ﴿قَالَ يَا بُنَيَّ لاَ تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ عَلَى إِخْوَتِكَ

﴿فَيَكِيدُوا لَكَ كَيْدًا﴾(یوسف:٥) پاشان چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە هەتا دەگات بە : ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ﴾(یوسف:١٠٠) واتە: باوكو دایکی لەسەر جێگەکە دانیشاندو باوكو دایكو براکانی سەری نەوازشیان بۆ نەویکردو، دواتر خوداوەند ئیسلامی نارد کڕنووشبردن نەماو لەبری کڕنووش تەوقەی دانا، پاشان (یەعقوب) لەخەودا بینی بەر لەوەی (یوسف) بپێکرێ سەرجەم ئەو رووداوانەی هات بەسەر (یوسف)دا لەلایەن براکانیەوەو بینی (دە) گورگ دەوری (یوسف)یانداوەو (یەعقوب) خۆشی لەسەر چیایەکەو (یوسف) لەدەشتێکدایەو بەزەیی پێداهاتەوە لەکاتێکدا (یوسف)ی جگەرگۆشەی نیگای تێبڕیبوو سەیری چیاکەی دەکرد کەباوکی پێوەبوو ، ئنجا زەوی درزو قڵیشی بردو یوسف رزگیبو بەنێوپاو گورگەکانیش بلاوەیان لێکرد، ئەمەش گوتەیبوو کاتێ بەکوڕەکانی وتە ﴿وَأَخَافُ أَنْ يَأْكُلَهُ الذِّئْبُ﴾(یوسف:١٣).

هەروەها چیرۆکەکەی (موسا) (سەلامی خوای لێبێت)دێت، ئەو چیرۆکەش بەوە دەستپێدەکات هەروەك (وهب) دەگێڕێتەوە (فیرعەون) خەوێك دەبینێ‌و بەهەم ترس‌ولەرزەوە بەئاگادێت " لەخەودا دەبینێ ئاگرێك لە(شام)ەوە دێت هەتا دەگاتە(میسر)و هیچ شتێك بەجێناهێڵێ‌و دەیسووتێنێ لەماڵ‌و لانەو فرۆشگاو دوکان‌و قەلاو پاسارو پەناگە، کاتێ لەخەو بەئاگادێت ترس‌وبیم زاڵدەبێت بەسەریاو خەڵکێکی بێشومارو زۆر لەگەورە پیاوانی ولات کۆدەکاتەوەو بۆیان دەگێڕێتەوە ، ئەوانیش دەڵێن: ئەگەر خەوەکەت بەو شێوازەبێت پیاوێك لەوەچەی(یەعقوب) سەرهەڵدەداو (میسر)و فەرمانڕەوایانی لەسەردەستی ئەو تیادەچێت‌و دەستەلات‌و کۆشکەکەی تۆش لەسەردەستی ئەودا دەڕوخێ‌و هەرسدەهێنێ.

هەر لەوکاتەدا(فیرعەون) بڕیاری کوشتنی منداڵان دەردەکات هەتا خوداوەند راڤەی خەوەکە دەردەخات‌و سەرجەم پیلان‌و فڕوفێڵی (فیرعەون)و کاسەلێسەکانی

هــیچ ســوودێکی نابێــتو بەڕادەیــەك ویــستی خوداوەنــد زاڵــدەبێت بەســەر (فیرعەون)داو لەئامێزی ئەو ستەمکارەدا پەروەردە دەبێتو پاشــان لەسەردەســتی (موسا) تیادەچێتو مەزنیو شکۆی خوایی دیاریدەدات.

هەروەها (ئیبن عەباس) (رەزای خوای لێبێت) دەفــەرموێت: "ســیحرو جــادوو کرا لەپێغەمبەر(ﷺ)و دەچوە ژوورەوە بــۆ لای خــاتوو (عائــشە)و دواتــر گومــانی هەبوو ، ترساین لەو حاڵەی بەسەریا هاتوە ، لەنێوجەرگەی ئــەو حاڵــەدا رۆژێــك پێغەمبەر(ﷺ) لەنێوان خەووبێداریدابوو دوو فریشتە هاتن بۆلایو یــەکێکیان لای سەریو ئەوی دی لای قاچی دانیــشت، ئــەوەی لای ســەری بــەوەی لای قاچــی وت: چییەتی ، پێغەمبەر (ﷺ) حاڵیبوو لەوەی دەیانگوتو وتی: جادوویلێکراوە ؟ ئنجا پرسی: کێ وای لێکردوە؟ وتی: لەبیــدی کــوڕی ئەعــصەمی جولەکــە ، دیــسان پرسی: لەکوێ وای لێکردوە ؟ وتی: لــەبیری (ذروان) ، وتــی: چارەســەری چــییە؟ وتی: کەسێك بنێرێ بۆ ئەوبیرەو ئاوی تێــدا نــەهێڵێو هــەتا دەگــات بەبــەردێكو بەردەکەش هەڵبکەنێو لەژێر بەردەکــەدا دەزوو کــشتەکێ لەپەلکەدارخورمایــەك ئالاوە یانزە گرێی لێداوە ، پاشــان بیــسوتێنێ پــشت بــەخوا چــاکدەبێتەوە، کــاتێ پێغەمبــەر(ﷺ) بــەئاگاهات لــەگوفتاری هــەردوو فریــشتەکە حــاڵیبوو ، ئنجــا (عەمار)ی کوڕی (یاســر)ی نــاردو لەگــەڵ ژمارەیــەك لــەیاران بــۆ ســەربیرەکەو ئاوەکەی گۆڕابوو وەك ئاوی خەنەی لێهاتبوو ، ئنجــا هــەموو ئاوەکــەیان دەرهێنــا هەتا گەیشت بەو بەردەو دەریانهێناو پەلکەدارخورماکەیان دۆزییەوەو دەزوویەکی یانزە گرێدراوی پێوەبوو، پاشان هێنایان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەوجا ئەم دووسوورەتە دابەزی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ و ئــەم دوو ســوورەتە (١٠)ئایــەتبوو هەرئایــەتێکی دەخوێنــد گرێیــەك دەکرایــەوە، کــاتێ هــەموو

گرێکانکرایەوە پێغەمبەر (ﷺ) هەستا وەك ئەوەی لەبەربەستو چورتمێ قوتاربووبێ[٧].

پاشان گرێ تاکەکەشی سووتاند، ئنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانیکرد بەودوو سوورەتە خۆیان بپارێزنو، هەرکاتیش (لبید) دەهات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ئەو رووداوەی نەدەدالەرووی.

ئەم هەموو رووداوانەش بەڵگەیە لەسەر جێگیربوونی خەوو چیرۆكو باسوخواسی زۆر هەیە لەو بارەیەوە.

(ئەبوسەعد) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: کاتێ هەستمکرد زانیاری بەرینوفراوانو هەمەچەشنەو سوودیشی دابەشبوە بەسەر هەردوو دنیادا، زانیاری خەویش یەکێکە لەوزانستە بەسوودانەی لەئاینو دنیادا بەسوودو کەڵکە بۆیە پشتبەخوا رێگەی فێربوونو شارەزایی ئەم زانستەم گرتەبەو پەنامگرت بەخودا لەفیتنەو بەلاّو نەهامەتی...

هەروەها دەفەرموێت: مرۆڤ پێویستی بەچەند سرووتێکدەبێ بۆ دروستی خەو، لەوانە:

١)دەبێت راستگۆبێت لەسەرجەم وتەکانیدا، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((خەو راسترینتان ئەوەیە راستگۆیە لەوتەکانیدا))[٨].

٢)دەبێت هەوڵبدات پارێزگاری بکات لەبەکارهێنانی سروشتی پاكو فیترەتی بێگەرد، لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێرنەوە پرسیاری لەیارانیکردوە هەموو رۆژێك دەربارەی خەونەکانیانو وتویەتی: ((کامتان دوێنێ خەوێکی بینیوە))[٩] یارانیش بۆیانگێراوەتەوەو بۆی راڤەکردوون، ئنجا چەندین رۆژ پرسیاری لێکردوونو

---

[٧](بوخاری) (٥٧٦٦).

[٨](مسلم)(٨/٦/٢٢نووی)و (ئەحمەد) لە(مسند)ەکەیدا(٢/٢٦٩).

[٩](بوخاری) (٧٠٤٧، (مسلم) (٨/٢٣/٢٢٧٥)(نووی).

کەسیان خەوی نەبینیوە هەتا باسی بکەن‌و پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموویەتی: چۆن خەودەبینن لەکاتێکدا نینۆکتان ئاوادرێژ بوە ، چونکە نینۆککردن لەسروشت‌و چاکییەوەیە.

٣)دەبێت خەوبینەر لەسەرپاکی بنوێت، لە(ئەبی زەر)ەوە دەگێڕنەوە (ﷺ)فەرموویەتی: خۆشەویست‌و دۆستەکەم ئامۆژگاریکردم بەسێ ڕەفتار دەستبەرداریان نەبم: "ڕۆژووی سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێکدا، دووڕکات نوێژی پێش نوێژی بەیانی‌و هەمیشە بەدەستنوێژەوە بنووم".

٤)دەبێت لەسەر لای ڕاستی بنوێت چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەهەموو شتێکدا لای ڕاستی پێخۆشبوە[١٠].

هەروەها دەگێڕنەوە کەپێغەمبەر (ﷺ) لەسەرلای ڕاستی دەنوست‌و دەستی دەخستەژێر کوڵمی ڕاستی‌و دەیفەرموو: "پەروەردگارا " لەسزاوخەشمت بمپارێزە لەڕۆژێکدا بەندەکانت کۆدەکەیتەوە"[١١].

هەروەها لەخاتوو (عائشە)ەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە کاتێ چوەتە سەر جێگە بۆ نوستن دفەرموویەتی: "پەروەردگار داواخوازی خەوێکی خۆش‌و باش‌و ڕاست بەدەر لەخەوی درۆم‌و ، خوازیارم ئەو خەوە سوودم پێگەیەنێ نەك زیان‌و لەیادم بێ‌و بیرم نەچێتەوە".

٥)لەهەندێك ڕێگەوە هاتوە سوننەتە بۆئەوەی دەخەوێت کاتێ چوە سەر جێگەکەی بڵێ: "پەروەردگارا من پەنادەگرم بەتۆ لەلەشگرانی‌و خەونی خراپ‌و یاریکردنی شەیتان پێم لەحاڵی بێداری‌و خەودا".

٦)سوننەت وایە ئەوەی خەوێکدەبینێ‌و دڵتەنگ‌و نیگەراندەبی هەڵبسێت بەجێبەجێکردنی (پێنج)خاڵ:

---

[١٠] (مسلم) (٢/٦٧ لا/١٦٣)(نووی).

[١١] (ئەبوداود)(٥٠٤٥)و (ئەحمەد) لە(مسند)ەکەیدا (٢٨٨/٦)و (اسناد)ەکەی (صحیح)ە.

+تفبکات بەلای چەپیدا.
+پەنا بەخوا بگرێ.
+هەڵبسیو نوێژ بکات.
+باسی خەوەکەی بۆکەسنەکات.

دەگێڕنەوە پیاوێکدێت بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا جاری وا هەیە خەو دەبینم غەمو پەژارە دڵتەنگمدەکات، ئەویش (ﷺ) دەفەرموێ: "منیش بەهەمان شێواز خەوی وادەبینم خەمبارمدەکات، ئەگەر لەو جۆرە خەونەت بینی سێ تف بکە بەلای چەپداو بڵێ: پەروەردگارا من داواخوازی خێری ئەو خەوەمو پەناشدەگرم بەتۆ لەشەڕی".

لەو خەونانەشی پووچو بەتاڵە مەردوم ئاسمان ببینێ وەك سەقفێکی لێهاتوەو بترسێ بکەوێ بەسەریاو زەویش وەك دەستاڕو ئاش وابێت یاخود دارو درەخت لەئاسمان روابێت یان لەسەرزەوی ئەستێرە هەڵهاتبێت یا شەیتان ببێ بەفەرمانڕەوا، هاوچەشنی ئەو خەوانەش کەماناو راڤەی نییە:

(١)کەسێك پیشەی لەگەڵ خوێندابێت سووری ببینێ.
(٢)کەسێك پیشەی لەئاودابێتو هەمیشە تەڕبێت تەڕی ببینێ.
(٣)یەکێك لەتاریکاییدابێتو تاریکایی ببینێ.
(٤)ئەوەی لەسەرماو سۆڵەدا کاریکات هەمان حاڵو بار بەدیبکاتەوە.

هەروەها راسترین خەو ئەوەیە لەرۆژدا یان کۆتایی شەودابێتو لەپێغەمبەرەوە(ﷺ)دەگێڕنەوە فەرموویەتی: "راسترین خەو ئەوەیە لەکاتی بەرەبەیان[١٢] ـ پێش بانگی بەیانی بێت ـ ".

هەروەها دەگێڕنەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "راسترین خەو هی رۆژە چونکە خوداوەند لەرۆژدا نیگای بۆ ناردووم"[١٣].

---

[١٢] (ترمذي)(٢٢٧٤)و(دارمي)(٢١٤٦)و(ئەحمەد) لە(مسند)ەکەیدا(٢٩/٣)و (سند)ەکەی (لاوازە).

هەروەها لە (جەعفەری صادق)ەوە دەگێڕنەوە - ڕەزای خوای لێبێت - فەرموویەتی: "ڕاسترین خەو خەوی نیوەڕۆیە"..

(ئەبوسەعد) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: خەوبینەرچەن ڕیٚورەسمو ئادابێك هەیە پێویستە بیگرێتەبەر لەگەڵ ئەو سنوورو پەرێزانەی کەنابێت بیانشکێنێ بەهەمان چەشن بۆ ڕاڤەکاری خەویش.

لەئاداب و ڕیٚورەسمەکانی خەوبینەر:

١ـ نابێت بۆکەسێکی ئیرەییبەری بگێڕێتەوە بۆنموونە دەبینین (یەعقوب) (سەلامی خوای لێبێت) بە (یوسف) دەڵێت: ﴿لَا تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ عَلَىٰ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا لَكَ كَيْدًا﴾ (یوسف:٥).

٢ـ نابێت خەوەکەی بۆ کەسێکی نەزان بگێڕێتەوە، لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: "خەوەکەت بۆ خۆشەویستو ژیرێك بگێڕەوە"[١٤].

٣ـ نابێت درۆبکات لەخەوگێڕانەوەدا، لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: "ئەوەی لەخەودا درۆبکات لەڕۆژی قیامەتدا داوای لێدەکرێ دوو دەنك جۆ بەیەکەوە گرێبدات"[١٥].

٤ـ نابێت خەو بۆ منداڵ بگێڕێتەوە هەتا دەتوانێ بە نهێنی باسیبکات.

## لەئاداب و ڕیٚورەسمەکانی ڕاڤەکارانیش:

١) دەبێت گەشبینی بخاتە دڵی خەوبینەرو دەستەواژەی ئاسوودەیی و دڵنیایی بباتە نێو دڵو دەروونی.

---

[١٣] (هندی) لە (کنز العمال) (٤١٤٣٨)هێناویەتی و خیتویەتیە [illegible] (دیلمی) لەفەرموودەیەکی (جابر)دا.

[١٤] (ئەبوداود) (٥٠٢٠) و (ترمذي) (٢٢٧٨) و (ئیبن [illegible]) [illegible] لە(مسند)ەکەیدا (١٠/٤)و (اسناد)ەکەی (صحیح)ە.

[١٥] (ترمذي) (٢٢٨١) و(دارمی) (٢١٤٥) (ئەحمەد) لە[illegible] (٥٦٨).

٢)دەبێت لەباشترین ڕێگەوە راڤەیبکات، لەپێغەمبەرەوە (ﷺ)دەگێڕنەوە فەرموویەتی: "خەو بەوچەشنەیە راڤەیدەکەیت" [١٦].

٣)نابێت پەلەبکات لەراڤەکردندا.

٤)نابێت باسیبکات چونکە ئەسپەردەو ئەمانەتەو دەبێت لەکاتی هەڵهاتنی خۆرو ئاوابوونیدا لێکینەداتەوە.

٥)دەبێت جیاوازی بکات لەنێوان خەوی هەر مەردومێك بەپێی پلەوپایەی خۆی.

٦)دەبێت خەوی باش لێکبداتەوەو خەوی خراپیش بێدەنگبێ لەسەری، بەلاّم ئەگەر نیوەی باشبوو نیوەی خراپ بەپێی بنەماکان بەلایەکدا باسیبکات ، بەلاّم ئەگەر هەرتێکەڵبوو لێی باپرسیاریکات سەبارەت بەناوی خەوبینەرو ئەوجا بەپێی ناوەکەی راڤەیبکات، لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: "ئەگەر خەو تێکەڵو ئاڵۆزبوو لاتان بەپێی ناو راڤەیبکەن".

بۆنموونە ناوی (ئاسان) ئاسانییەو (ئەحمەد)و (محەمەد) ستایشەو (سەرکەوت) سەرکەوتنەو (ئاشتی) ئاشتەواییەو (بەختیار) بەختیارییەو بەوچەشنە...

٧)دەبێت لەودەمەیا چی هاتە بەردەمی بەهەند وەریبگرێ، ئەگەر پیربوو دنیایەکی بەسەرچوەو ئەگەر ئوتومبیلو بارگیرو ئەسپو گوێدرێژبوو سەفەرە بەپێی ئایەتی: ﴿ وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ﴾ (النحل: ٨).

ئەگەر لەوکاتەدا گوێی لەزەڕینی گوێدرێژبوو یەکجار یان سێ یاخود چوار ئاشەش خێرە ، ئەگەر چوار جاربوو جارێك لاببات و سیانی دەمێنێتەوەو بەخێر دادەنرێ، ئەگەر شەش جاربوو بۆ گەورە پیاوانەو دووجاریش باش نییە.

لە(ئیبن عەباس)ەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: "ئەگەر قەلەڕەش سێجار قیڕەیکرد باشە بەلاّم ئەگەر دووجاربوو خراپە".

---

[١٦](ئیبن سنی) لە(عمل اليوم والليلة)(٧٧٠).

٨)گێڕانەوەی خەو لەڕۆژی سێشەممەدا باش نییە چونکە ڕۆژی کوشتارو خوێن ڕشتنە، هەروەها ڕۆژی چوارشەممەش ڕۆژی نەهامەتی بەردەوامەو لەسەرجەم ڕۆژکانیتردا هیچی تێدا نییە.

ئەم ئەندازەیەش لەبنەماکانی خەوو باسەکانی جێگەی سوودو کەڵکەو هیوادارین کەلێنێکی پڕکردبێتەوە.

# پێشەکی وەرگێڕ

خوێنەری هێژا پاش ڕێزوسلاو...

یەکێك لەنیازە سەرەکییەکانی مرۆڤ خەوەو بێگومان خەو یەکێکە لەو دیاردانەی لەگشت سات و کاتێکدا دووبارە دەبێتەوەو بەپێی یەکێك لەو لێکۆڵینەوانەی کراوە مرۆڤێك ئەگەر(٥٠)ساڵ تەمەنی بێت ئەندازەی (١٨٠٠ڕۆژو ٤٥٠٠٠)هەزار کاتژمێر لەخەودا بەسەردەبات و پێگەیەگی گرنگی تەمەنی داگیردەکات[١] لەکاتی خەویشدا خەو دەبینێت لەبەرئەوە زانستی لێکدانەوەی خەو بەدیهاتوو.

سەرباری ئەوە زانایان بەیەکەم زانستیان داناوە گەلەدنیادا سەریهەڵداوەو[٢] گرنگیەکی تەواویان پێدراوە لەدێر زەمانەوەو لەسەردەمی پێغەمبەرانەوە ئەم زانیارییە تیشکی خراوەتەسەرو بەپێی یاساو ڕێسای تایبەت لێکدراوەتەوە، هەروەها لەنێو فەیلەسوفەکانیشدا (ئەرەشمیدۆس)[٣] هەڵساوە بەراڤەی ئەم دیاردەیەو جیهانی خۆرئاواش هەوڵیانداوە بەجۆرێکی ئەکادیمی مامەڵەی لەگەڵدا بکەن و وەك زانیارییەك بخوێنرێ لەزانستگەکانیاندا[٤].

هەروەها کتێبەکەی (ئیبن سیرین) بۆیەکەمجار وەرگێڕدراوەتە سەر زوبانی (فەرەنسی) وەك هەوڵێك بۆ کردنەوەی دەروازەی جیهانێکی تایبەت کەبەدوورە لەمادیات[٥].

بەڵام ئەوەی جێگەی مشتومڕو قسەو باسبوە هەریەك لەزانایانی ئاین و دەروونناس کێشمەکێش و گوفتاری جیاوازو ناچوونیەکیان هەبوە بەرانبەر ئەم دیاردەیە.

زانایانی دەروناس بەچەشنێك ڕاڤەی خەودەکەن گوایە هیچ هەواڵ و باسێکی داهاتووی هەڵنەگرتوەو گوزارشت لەفشاری سێکسی و هەست و نەستدەکات یاخود حەزو ئارەزوویەکی سەرکوتکراوە ئەو دیاردەیەی وەبەرهێناوە[٦].

---

[١] الشبكة العالمية ـ معلومة ، علم تفسير الأحلام M٢loma.com

[٢] رحلة في عالم الأحلام ـ شبكة العراق الثقافية www.iraqcenter.net

[٣] معلومة. نافذة للحياة العصرية M٢loma.com

[٤] رحلة في عالم الأحلام ـ شبكة العراق الثقافية www.iraqcenter.net

[٥] الهدهدنت.

[٦] الأحلام وعلم النفس ـ السر الغامض ـ منتديات رجة.

سەرقافڵەی ئەم رایەش (فرۆید) ەو بۆچوونەکانی تاسەردەمێکی دووردورێژ سەرباسی کتێبە دەروونناسیەکانی داگیرکردبوو بەلاَم دواتر بۆچوونەکانی کەوتنە بەر نەشتەری روحانیەکانو ئەو بۆچوونانەیان لەخانەی (خەوی هەڵەتو پەڵەت)دا جێکردەوە.

هەندێکیش لەزانایانی فسیۆلۆژی دیاردەی خەویان گەڕاندوەتەوە بۆ پڕبوونی گەدە یان دروستبوونی ئێشو ئازار لەلەشو لاردا بەلاَم دەروازەکانی ئەم رایانەش لەسەر گومانو ئەگەرە جۆراوجۆرەکان دامەزراوە بۆیە بەهەند وەرناگیرێ[٧] .

کۆمەڵێکی دیکەش لەزانایان دیاردەی خەویان گەڕاندوەتەوە بۆ ئاماژە دەرەکییەکانو ئەمەش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کەسێك خوازیاری ئەنجامدانی کارێکەو کاتێ دەخەوێت لەخەونەکەیدا هەموو ئەو کارانە ئەنجامدەدات بەلاَم کاتێك بەئاگادێت هێشتا هیچ لەوکارانە بەدینەهاتوە، دەگونجێت هەندێك خەو لەوخانەیەدا جێببێتەوە بەلاَم ناتوانرێت مۆرکێکی سەرتاسەری لێبنرێ[٨] .

لەبەرانبەر ئەم راوبۆچوونانەدا زانایانی ئاین راڤەیەکی تایبەتیان هەیە بۆ خەو بەدەر لەبۆچوونی زانایانی دەروونناسو یەکێکی وەك دکتۆر محمد سەید طنطاوی شێخی ئەزهەر خەودەکات بەسێبەشەوە:

یەکەم/خەوێك مژدەیە لەلایەن خوداوەندەوەو هەروەك قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێدەکات لەباسی چیرۆکی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت)و چیرۆکی (ئیبراهیمو ئیسماعیل) (سەلامی خوایان لێبێت)

لەگەڵ ئەو خەونەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەیبینێ کەدەچنە مزگەوتی (حەرام) دوای ئەوەی (٦)ساڵ رێگرییان لێکرا دواتر خەونەکەی هاتە دی.

دووەم/خەوێك شەیتانییەو بەخەوی هەڵەتو پەڵەت ناوزەدکراوو شتی جوداو جیاوازی تێدا کۆبوەتەوەو پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی پێکردوە ئەو خەوە لەشەیتانەوەیە.

سێیەم/ئەوەی مرۆڤ لەکاتی بێداریدا گرنگی پێدەداتو دواتر خەوی پێوەدەبینێ وەك کەسێکی برسی بیروهۆشی لای خواردنەو دواتر لەخەودا خواردن دەخوات[٩] .

---

(٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٨) رحلة في عالم الأحلام ـ شبكة العراقية الثقافية.

(٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دیدوبۆچوونی زانایانی ئاین لەگەڵ زانایانی دروونناس دوو هێڵی دژەیەکن چونکە بنەماکانی راڤەو لێکدانەوەیان جیاوازن، زانایانی ئایینی بنەماکانیان لەقورئانی پیرۆزو فەرموودەی پێغەمبەرو واقعی مێژوویییەوە سەریگرتوەو کەسێك بڕوای بەجیهانی پەنهان‌و نادیار نەبێت ناتوانێت ئەو ڕێسایانە جێبەجێبکات.

هەندێك لەزانایانی کۆمەڵناسیش رای تایبەتیان هەیە سەبارەت بەدیاردەی خەو ، دکتۆرە (سامیە ساعاتی) مامۆستای زانکۆی (عین الشمس) لەمیانەی باسکردنی خەودا دەڵێت: "نابێت خەو لەژیانماندا فەرامۆش بکەین یاخود گاڵتەو سووکایەتی پێبکین بەڵام نابێت هەموو هەوڵی خۆشمان لەلێکدانەوەی خەوەکاندا بەگەڕ بخەین"[10].

لەمیانەی ئەو بەربەرەکانییەی لەنێوان هەردوو بۆچوونەکەدا هەیە دکتۆر (محمد عوسمان) راگری کۆلیژی پەروەردە لەزانکۆی (ئەزهەر) دەڵێت: "دەبێت جۆرێك لەمیانەڕەوی پیادەبکرێت‌و نابێت ئەم زانستە فەرامۆش بکرێت‌و دەبێت گرنگی بدرێت بەدەستەواژەو لێکدانەوەکان‌و بەئەندازەی خۆی بەهەندبگیرێ".

لەلایەکی دییەوە (ئەحمەد صەباحی)سەرکردەی حیزبی (الامة)ی میسری دەڵێت: دەبێت زانستی خەو بکرێت بەزانستێکی ئەکادیمی‌و لەخوێندنگەو زانکۆکاندا بخوێنرێت چونکە خاوەن بنەماو رێسای تایبەت بەخۆیەتی‌و چەندین نووسراوو لێکدانەوە هەیە لەبارەیەوەو یەکەم زانیاریشبوو کەدنیای پێناوەدانکرایەوەو گونجاوە لەزانکۆکانی پزیشکی‌و ئادابدا بخوێنرێ هاوچەشنی رۆژئاوا چونکە نەزانینی ئەم زانیارییە یاریدەدەرە لەئەنجامدانی تاوان‌و دەبێت خەڵکی راڤەی خەونەکانیان بۆ بکرێ لەپێناوی ئەوەی لەوەسوەسەو گومان بەدووربن"[11].

زانایانی موسوڵمانیش چەندین رێساو تایبەتمەندییان بۆ خەو داناوەو بەدەر لەو رێساسیانە راڤەکردن پووچ‌و بەتاڵدەبێت، هەروەك لەپێشەکی (ئیبن سیرین)و (نابلسی)دا ئاماژەی پێکراوە.

لەمیانەی ئەو باسەشدا پێشەنگی مزگەوتی(حەرام) دەڵێت: "دەبێت ئەوانەی راڤەی خەودەکەن بزانن ئەرکێکی مەزن کەوتوەتە ئەستۆیان سەبارەت بەخەوبینەر بۆیە دەبێت ئەم مەرجانەیان تێدابێت:

---

[10] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[11] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١ـ زانیارییەکی بەرین‌و فراوانی هەبێت لەم بوارەدا.

٢ـ چاك‌و خراپی ئەم بوارە بزانێت.

٣ـ نابێت فتواو بڕیاری شەرعی بدات لەم روانگەیەوە.

٤ـ دەبێت پارێزگاری بکات لەنهێنی خەڵکی‌و بلاّوینەکاتەوە، لەم بارەیەوە (ئیبن القیم) دەڵێت: فتوادەرو راڤەکاری خەو لەگەڵ پزیشك دەکەون بەسەر نهێنی خەڵکیداو دەبێت بیشارنەوەو باسینەکەن[١٢] .

هەروەها (هیشامی کوڕی حسان) (رەزای خوای لێبێت) لە (ئیبن سیرین)ەوە دەگێڕێتەوە زۆرجار پرسیاریان لێکردوە دەربارەی سەدان خەو بەلاّم بەنازانم وەلاّمیداوەتەوە[١٣] .

زۆرجاریش لێکدانەوەو راڤەی خەو بەبێزانیاری دەبێتە هۆی دروستکردنی گومان‌و وەسوەسە بۆ خەوبینەر بەڕادەیەك ژیانی لێدەشێوێنێ‌و تووشی گرێی دەروونیدەکات، بۆنموونە بەکیژێك یان کوڕێك بگوترێ لەقوتابخانەو خوێندن دەرناچیت، یاخود بەژنێك بگوترێ مێردەکەت ژنت بەسەردەهێنێ‌و...ئەم لێکدانەوانە بەبێزانیاری مەردوم تووشی وەسوەسەو نائارامی دەروونده‌کات.

بۆیە لەوخاڵە گرنگانەی کەدەبێت رەچاوبکرێت لای راڤەکاری خەو هەروەك شێخ (نەبیلی کوڕی سیرین) دەڵێت: "دەبێت خوێندنەوەیەك بکرێ لەحاڵ‌و باری خەوبینەرو بەوە راڤەبکرێت"[١٤] .

**خودی خەویش لەرووی پۆلێنکردنەوە لای زانایانی دەروونناس دەکرێت بەچەند بەشێکەوە:**

یەکەم/خەوی جۆراوجۆر.

دووەم/خەوی بچڕ بچڕ.

سێیەم/خەوی دووبارە.

چوارەم/خەوێك ویست‌و ئارەزووی تیا بەجێدێت.

پێنجەم/خەوێك ترس تامێزبێت.

---

[١٢] الرؤى والأحلام في ميزان الإسلام عن خطبة شغف الناس بالتحدث عن الأمور الغيبية.

[١٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٤] رحلة في عالم الأحلام ـ شبكة العراق الثقافية.

شەشەم/ خەوی هەڵگری رووداوی داهاتوو.

حەوتەم/خەوی تێکەڵو پێکەڵ

هەشتەم/خەوی مۆتەکاوی‌و راچڵەکێنەر[١٥].

هەروەها دەڵێن: ئەوەی لەخەو وردبیێتەوە دەبینێت خەو بەسێ قۆناغدا تێپەڕ دەبێت:

یەکەم//چوونە نێو خەو.

دووەم//قۆناغی جموجووڵ‌و خەوبینین.

سێیەم//قۆناغی خەوی قووڵ[١٦].

هەروەها دەگونجێت خەو جۆرێك بێت لەجۆرەکانی چارەسەری دەروونی بۆ نەخۆش، ئەوەی جێگەی سەرسووڕمانە لەدەقە کۆنەکاندا هاتووە ئیمامی (رازی) دەڵێت: "خەوەکەتم پێ بڵی هەتا نەخۆشیەکەت دەستنیشان بکەم" لەم روانگەیەوە (فرۆید)یش دەڵێت: خەو رێگەیەکی شاهانەیە بۆ بێئاگایی‌و غافلگیری"[١٧].

لەسۆنگەیەکی دیکەشەوە لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان دەرخستوە خەو لەم چەرخەدا بوە بەدیاردەیەکی تەواو جێگیرو ماناو واتاکانی راڤەدەکرێ‌و زانایان دەتوانن لەتێڕوانینیان بۆ مێشك راڤەیبکەن.

هەندێك لەپسپۆڕەکانی بواری (مێشك) وادەبینن خەو رۆڵێکی کاریگەری هەیە لەبیرکردنەوەو فێربووونداو مێشك پاکدەکاتەوە لەتێکەڵبوونی رووداوەکان[١٨].

شایانی باسەلەساڵی (١٩٩١)دا تیۆرێك سەریهەڵداوەو دەڵێت: خەو بەتەنیا پەیوەندی نییە بەڕابردووەوە بەڵکو رەنگدانەوەی ئایندەو داهاتووە ، هەر لەو روانگەیەوە

---

[١٥] دکتۆر (محمد الفار).

[١٦] رحلة في عالم الأحلام ـ شبكة العراق الثقافية.

[١٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو(فرۆید ئاماژە بەدوو ئاخ بۆ مرۆڤ دەکات "ئاخی ئاگا"و "ئاخی شاراوە" ئاخودئاگاه".

[١٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو. (زانایانی خەو رایان وایە هەموو کەسێك خەو دەبینێت بەڵام هەندێك فەرامۆشییەکەیان زیاترەو لەبیریان نامێنێت ، هەندێکیش لەبیریانە (بێگومان نەك سەرجەم خەوەکان بەڵکو هەندێکی).

دەتوانین چوستو چالاکیمان نوێبکەینەوە مێشکمان بەچەشنێ رێکبخەین روو بەخەونە جوانو رەنگاورەنگەکان[١٩].

لەلێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیدا کە(روبرت سمیث) لەزانکۆی (میشیگان) پێهەڵساوە لە(ئەمریکا)و خەوی (پەنجا) نەخۆشی خستوەتە ژێـر لێکۆڵینـەوەو ئەزمایـشەوە ئـەم نەخۆشانەش دووچاری نەخۆشی دڵبوونو لەلێکۆڵینەوکەیدا گەیشتوە بەم دەرەنجامانە:

+خەو وەك ئامێری (سیسمۆگراف)وایـە کەجووڵـەی زەوی لەقووڵاییـەکی بەرینـەوە دیاریدەکات بەرلەوەی بگات بەسەرزەوی‌و توێکڵی زەویـی‌و دواتـر ببـێ بەزەمینلـەرزەو وێرانکاری بخاتەوە.

+هێماکانی نێو خەو گرنگییەکی تایبەتیان لەخۆگرتوە، ئەگەر بتوانین لێیحاڵیببین کەئاماژەو ئاگاداری تێدایە بەنەخۆشکەوتن یان دیاریدانی نیشانەکانی.

+ئەوانەی کەخەو دەبینن تووشیارن بەحاڵەتێکی گرانو ئەستەمی نەخۆشی، چونکە پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان نەخۆشیەکی سەختوگرانو ئەوەی لەخۆی گرتووە.

+ئەو نەخۆشانەی باسی مردن لەلایان دووبارە دەبێتەوە حاڵوبـاری تەندروستیـشیان ئێجگار هەرەسیهێناوە.

+خەوی ژنو پیاو چوونیەکەو ئاوێتەی هەستو سۆزو دڵەراوکەو ترسوبیمە بەڵام ژن پتر خەودەبینێ هەتا پیاو[٢٠].

لێرەوە دەگەین بـەو دەرەنجامـەی (خـەوبینین)دیاردەیـەکی پڕنهێنییـەو جیهـانێکی هێماوییەو نیشانەو تایبەتمەندی خۆی هەیەو هەریەك لـەرێبازە ئـاینی‌و دەروونیـیەکان بەجۆرێك راڤەیانکردووەو گەیشتوون بەراستی ئەم دیاردەیـەو وابەسـتەی دەروونی خەوبینەرو، ئەگەر خەوبینەر بڕوایەکی پتەوی بەجیهانی غەیبو نادیار هـەبێت لەژێر سێبەری ئاینی مەزنو گەورەی ئیسلام ئەوا روو بەلێکدانەوەو راڤەی زانایانی ئیسلامی دەچێتو، بۆ گەیشتن بەو ئاستەش واپێویـستدەکات مـرۆڤ دیـدو ئایدیایـەکی هـەبێت بەرلەوی هیچ گوفتارێك دەربارەی ئەم زانستە بکات چونکە زانستی(خەو) یەکێکە لە زانـستانەی چـەندین لێکۆڵینـەوەی لەسـەرکراوەو راڤـەکارانی گەیـشتوون بەراسـتی مەسەلەکانو دنیایەکی روحانی پاكو بێگەرد.

هـەروەها لەدەروونـشیکاریدا نـەخۆش بەشـێوازی (خـەوی دەسـتکرد)دەخـەوێنن‌و لەجیهانی خەودا ناخی دەخوێننەوە بۆ دۆزینەوەو چارەسەری نەخۆشییەکەی.*

---

(١٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢٠) www.daralhagat.com

# کتێبی خەونامەی کوردی

ئەم کتێبەی لەبەردەستدایە پێکهاتوە لەبەرهەمو رەنجی زانایانی خاوەن ئەزموون کەلەدنیادا وەك چرای نێو کۆمەڵگاکانیان وابوونو لەپێناوی زانستدا سەرجەم توانای جەستەیی و ماددیان بەگەڕخستوە ، هاوتای کتێبە پیرۆزەکانی دیکە ئەم کتێبانە گرنگی پێدراوەو موسوڵمانان بۆیگەڕاونەتەوە...

بەڵام ئەوەی گرنگە لای خوێنەری کوردی نابێت ئەم کتێبە وەك دەقێکی قورئانی یان فەرموودە تەماشا بکات چونکە لێکدانەوەکان لەسەدەمو کاتێکی تایبەتدابوونو ئەو دەمە کۆمەڵگەو پێکهاتەکانی مۆرکێکی دییان هەبوە، لەکاتێکدا دەکرێ خوێنەری کوردی رۆشنبیری‌و زانیارییەکی گشتی هەبێت دەربارەی راڤەی خەوو پێکهاتەکانی لای گەورە زانایانی ئەو بوارە.

ئەرکی من لێرە وەك وەرگێڕو رێکخەری وشەکانە بەپێی ئەلفبێی کوردی‌و قسەو لێدوان بەکەمی لەسەر هەندێك راوبۆچوون کەهەریەك لە(ئیبن سیرین)و هاوەڵانی راڤەکاری دەریانبڕیوە، وێڕای ئەوەی بۆیەکەمجارە(خەونامە) بەو چەشنە چاپبکرێ‌و لەگەڵ کتێبەکەی (ئیبن سیرین)دا دووکتێبی دیکە بهێنرێ‌و بابەتەکانی پێدەوڵەمەندبکرێ‌و شێوازی فەرهەنگێکی خەونامەی کوردی بەبەردابکرێ.

لەم کتێبەدا جۆرێك لەئەکادیمیەتی تێدا رەچاوکراوەو بەچەشنی فەرهەنگی کوردی رێکخراوە، بۆ دۆزینەوەی وشەکان خوێنەر دەتوانێت یەکەمو دووەم پیتی وشە وەربگرێ راستەوخۆ بچێتەسەر وشەکە، بۆنموونە ئەگەر خوێنەر بگەڕێ بەدووی وشەی(هەنار)دا دەبێت لە(هـ ە)دابیدۆزێتەوە کەناونیشانێکی لاوەیەکی هەیەو لەسەرجەم بەشەکانی پیتەکەشدا لەریزبەندی ئەلفبێی وشەکە ریزکراوە.

کەواتە خوێنەر دەتوانێ دووپیت لەوشەی خوازراو وەربگرێ‌و بیدۆزێتەوە.

---

* ئەمەش ئاماژەیە بۆ (هایپنۆتیزم).

# تایبه‌تمه‌ندی ئه‌م خه‌ونامه‌یه

١)پیته‌کان به‌پێی تازه‌ترین ریزبه‌ندی ئه‌لفبێی کوردی رێکخراوه، بۆنموونه پیتی سه‌ره‌کی بناغه‌یه‌و پیته لاوه‌کییه‌کان به‌دوایاندا دێن له‌وانه:

+ئه‌گه‌ر خوێنه‌ر به‌دووی وشه‌ی (بینا)دا بگه‌ڕێ ده‌بێت له‌( ب ی) دابگه‌ڕێ‌و که‌پێش (ب ێ)دێت‌و واژووی شێوازی رابردوه.

+هه‌ریه‌ك له‌پیته‌کانی (و) (وو) (ۆ) به‌دووی یه‌کدا ناونیشانی لاوه‌کییان وه‌رگرتوه بۆ نموونه (خود)له‌(خ و)و (خووری) له‌(خ وو) و(خۆر) له‌(خ ۆ)دا.

٢)راکانی (ئیبن سیرین)و (نابلسی)و (دمیری) به‌دووی یه‌کدا هاتوه له‌سه‌ر بابه‌تێك‌و به‌که‌میشرای (نابلسی) پێش رای (ئیبن سیرین)که‌وتبێت‌و ئه‌مه‌ش بۆ ده‌وڵه‌مه‌ندکردنی ئه‌و باسه‌یه‌و خستنه‌ڕووی ئه‌گه‌ری دیکه‌یه.

٣)پێشه‌کی هه‌ریه‌ك له‌(ئیبن سیرین) و (نابلسی) له‌م کتێبه‌دا وه‌رگێردراوه بۆ زوبانی کوردی به‌هیوای به‌ده‌رخستنی زانستی خه‌وو گوفتاری پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) له‌گه‌ڵ یاران‌و شوێنکه‌وتوان‌و زانایان له‌و باره‌یه‌وه.

٤)ده‌قه عه‌ره‌بییه‌که به‌شێوه‌ی نووسینی کۆن نووسراوه ئه‌مه‌ش جۆرێك له‌تێکه‌ڵی دروستکردوه بۆیه هه‌وڵمداوه هه‌ر زانیارییه‌کی تازه به‌جیا بهێنمه‌سه‌ری دێرو نیشانی (*) بۆ دابنێم‌و کاتێکیش ئه‌و وشه‌یه به‌ڵگه‌بێت له‌سه‌ر رووداوه‌کان‌و هه‌ر حاڵ‌و بارێك هێمای(+)م بۆ داناوه.

٥)ئایه‌ت‌و فه‌رمووده‌و گوته‌کانی براو نه‌ته‌وه‌سه‌ر سه‌رچاوه‌کانی خۆیان.

٦)لێکۆڵه‌ری ده‌قی عه‌ره‌بی زۆرجار دووباره بوونه‌وه‌ی ده‌قێکی به‌سه‌ردا تێپه‌ریوه‌و لێره‌دا من به‌باشم نه‌زانیوه زانیارییه‌کی دووباره بخه‌مه‌روو.

٧)له‌م کتێبه‌دا کورته‌یه‌ك له‌ژیاننامه‌ی هه‌ریه‌ك له‌و سێزانایه تۆمارکراوه.

٨)پێڕستێکی ته‌واو بۆ سه‌رجه‌م وشه‌کان دانراوه‌و خوێنه‌ر ده‌توانێ به‌خێرایی وشه‌ی داواکراو بدۆزێته‌وه به‌و چه‌شنه‌ی ئاماژه‌م پێدا.

٩)پێشه‌کیه‌کانی کتێبه‌که ژماره‌ی تایبه‌تی خۆی وه‌رگرتوه‌و پیته‌کانیش به‌هه‌مان شێوه‌و له‌ژماره (١)ه‌وه ده‌ست پێده‌کات هه‌تا کۆتایی.

شایانی باس‌و جێگەی خۆیەتی زۆر سوپاسی مامۆستای بەڕێزو ئازیزو مامۆستا (فاروق عەبدولعەزیز)بکەم کەهەڵەگیری کتێبەکەی کردو سوودم لەسەرنج‌و تێبینیەکانی وەرگرت.

لەکۆتاییدا ئومێدەوارم ئەم کتێبە کەلێنێکی زانستی‌و رۆشنبیری لەکتێبخانەی کوردیدا پڕکردبێتەوەو هۆکارێکیش بێت بۆ خوێندنەوە لەو بوارەداو شارەزابوون لەدیدی زانایانی بواری راڤەی خەوو توانیبێتم پەرتوکێکی دەوڵەمەند لەئاستی خۆیدا پێشکەش بەکتێبخانەی کوردی بکەم.

**رزگار کەریم**

# کورتەباسێکی ژیاننامەی (ئیبن سیرین)[*]

ناوی (محمدی کوڕی سیرین)ی (بەسری ـ ئەنسارییە) لەوادەی خیلافەتی (عوسمانی کوڕی عەفان)دا (رەزای خوایان لێبێت) لەدایکبووە سالّی (٣٣) کۆچی بەرانبەری (٦٥٣)زانینی .

بەخواناسیو دنیا نەویستی ناسراوەو، یەکێبوە لەپێشەنگانی سەردەمی خۆی لەسەرجەم زانیارییەکانداو بەزانیاریو راڤەکردنی خەوناسراوە.

(ئیبن سیرین) لەسەردەستی هەندیك لەیاراندا خوێندوویەتی وەك (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر)و (جوندوبی کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی)و (ئەبوهورەیرە)و (عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر)و (عیمرانی کوڕی حوصەین)و (عەدی کوڕی حاتەم)و...چەندین یارو هاوەڵی دیکەی پێغەمبەر(ﷺ)

هەروەها گوێبیستی هەندێك لەشوێنکەوتوانبوە لەوانە (عوبەیدەی سەلمانی)و (شورەیح)و (قەیسی کوڕی عەباد)و هەندێکی دیکەی تابعین.

هەروەها دەڵێن گەیشتوە بەپتر لە (٣٠)هاوەڵی پێغەمبەرو (ﷺ)فەرموودەی لێگێڕاونەتەوە.

ژیانی (ئیبن سیرین) پڕ لەکەشوبارە روحانیەکانبوەو بەدنیانەویستیو خواناسی ناسراوە، زۆر بەرۆژوبوەو یادگۆی هەمیشیبوە، رۆژنارۆژێك بەرۆژوبوە، ئەو رۆژەشی بەرۆژو نەبوە بەتەنیا نانی نیوەڕۆی خواردوەو پاشان تابەیانی دانیشتوەو رۆژەکەشی بەرۆژوبووە.

زوربەی کات دەم بەزیکربوەو خاوەنی (حەوت) ویردی تایبەت بەخۆیبوە شەوان خوێندوویەتی، ئەگەر یەکێك لەو ویردانەی نەخوێندبێت لەشەودا بەرۆژ قەرەبووی کردوەتەوە.

---

[*] أسلام اون لاين ـ حدث في العام الهجري ـ فقهاء ومحدثون.

(هیشامی کوڕی حەسان) دەڵێت: لەنیوەشەودا گوێم لەگریانی (محمد)ی کوڕی (سیرین) دەبوو کاتێ شەونوێژیدەکردو بەکوڵدەگریا...

هەرکاتیش باسی مردنی لەلابکرایە ڕەنگی لەشولاری دەگۆڕاو (ئەبونەعیم) لەکتێبی (طبقات)کەیدا بەئەمانەتپارێزو خواناس باسیکردوەو هەمیشە ڕووخۆش و دەبەم بەبزەو پێکەنینبوە.

بەڕادەیەك پلەوپایەکانی بەندایەتی تەیکردوە (بەکری کوڕی عەبدوڵڵای مزنی) دەڵێت: ئەوەی بەدووی خواناس و پارێزکاراندا دەگەڕێ با تەماشای (محمد)ی کوڕی (سیرین) بکات، سوێندبێت بەخوا لەو واریعترمان نەبوو.

لەرووی ئابووریشەوە بازرگانێکی کارامەبوە، لەنێو هاوەڵانیدا نموونەو پێشەنگبووە، جارێك کاروانێك (زەیت)ەکڕێ بە (چل هەزار)درهەم و لەیەکێك لەکوپەکاندا مشکێکی تۆپیو بەدیدەکات، پاکی و بێگەردی ویژدان و دڵودەروونی پاڵی پێوەدەنی هەموو کوپە زەیتەکانیتر دەڕێژێ و هیچی لێنافرۆشێت، لەئەنجامدا دووچاری زیندانیکردن دەبێت بەهۆی ئەو قەرزەی کەدێتە ئەستۆی لەبری کاروانە زەیتەکە، چیرۆکەکە بەم هەڵوێستە کۆتایی نایەت بەڵکو کاتێ بەرپرسی زیندان دەیەوێت ئازادیبکات بەهۆی ناوبانگ و شوهرەتەوەو شەوان بگەڕێتەوە نێو خانەوادەکەی خۆی ڕازی نابێت و دەڵێت: من یاسا ناشکێنم و سوێندبێت بەخوداوەند نابێت تۆش ناپاکی لەدادوەریکەیت...!

هەڵوێستێکی جوامێرو حەقپەروانەی دیکەی (ئیبن سیرین) لەوەدا خۆیدەبینێتەوە کاتێ لەزینداندا دەبێت (ئەنەسی کوڕی مالیك) کۆچی دواییدەکات و بەرلەمەرگی ڕایاندەسپێرێ بەوەی دوای مردنی (ئیبن سیرین) بیشوات بەڵام کاتێ بە (ئیبن سیرین) دەڵێن و مۆڵەتی بەرپرسی باڵای بۆ وەردەگرن هەتا بچێت (ئەنەس) بشوات ناچێت و دەڵێت: من بەرپرسی زیندان بەندینەکردووم بەڵکو کەسێك بەندیکردووم قەرزو حەقی لەلامە ، دوای ئەوەی خاوەن قەرز ڕێگەیدەدات ئەوجا لەزیندان بەدەردەکەوێت و (ئەنەس)دەشوات.

بەهەمان شێوە لەژیانی گشتیدا نموونەو پێشەنگی بەرزبوە، نەرم و نیان و چاکەکاربوە لەگەڵ دایکی و باڵی سۆزو میهری بۆ ڕاخستوەو هەمیشە بەدەنگێکی نزم و هێواش دواوە لەگوێڕایەڵی و ملکەچی و شەرمی خۆی بۆ نواندوەو هەندێك لەخزم و خانەوادەکەی

دەگێڕنەوە کاتێ (ئیبن سیرین) لەگەڵ دایکی دواوە لەبەردەمیدا خۆی بەکەمدانا وەو هەمیشە بەزوبانحاڵ لەدایکی پاڕاوەتەوە.

ئەم زانا خواناسە لەنێو تەنگەشەی قەرزاریدا دانبەخۆدا دەگرێتو زیکرو یادی خوادەکاتو شەوورۆژی بەنوێژو دوعاو پاڕانەوە بەسەر دەبات.

زانایانیش بەستایشەوە باسی(ئیبن سیرین) دەکەنو هەریەك بەچەشنێ باسی سیفەتە بەرزو باڵاکانی دەکات لەوانە:

* (خەتیبی بەغدادی)لە(مێژووە)کەیدا دەڵێ: "ئیبن سیرین بەیەکێك لەزاناو شارەزا خواناسو واریعەکانی سەردەمی خۆی دەژمێردرێ".

* (مورق الجلی) دەڵێت: "هیچکەسم نەدی ئەوەندەی ئیبن سیرین واریعو شارەزا لەفیقهدا".

* (عوسمان ئەلبەتی) دەڵێ: "لەم شارەدا کەسنەبوو ئەوەندەی (ئیبن سیرین) شارەزابێت لەدادگایا".

* (سوفیانی کوڕی عویەینە)دەڵێت: لەکوفەو بەسرەدا کەسێکی وارعو خواناسی وەك (ئیبن سیرین)ی تێدانەبوو.

هەروەها لەبواری گێڕانەوەی فەرموودەدا (ئیبن سیرین) چەند فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە لەیارانەوەو لە(نۆ)کتێبەکەی فەرموودەیا تۆمارکراوە.

لەروویەکی دیکەوە (ئیبن سیرین) بەزوبانپاراو ناسراوەو قسەکانی لەهەندێك کتێبدا تۆمارکراوەو خەڵکی پەندو ئامۆژگارییان لێوەرگرتوە لەو وتانە:

*"ستەم لەبراکەت دەکەیت ئەگەر باسی خراپترین هەڵوێستی بکەیتو چاو لەچاکەکانی بپۆشی".

*"قسەوباس گوشادوفراوانترە لەوەی کەسێکی نەخۆش بەدرۆ دەرببڕێ".

*"گۆشەگیری بەندایەتییە".

(ئیبن سیرین لەتەمەنی هەشتاساڵیدا لەشاری (بەسرە) لە ٩/ی شەوالی ساڵی ١١٠کۆچی بەرامبەر ١٥ی یەنایری ٧٢٩/زاینی کۆچی دواییکردوە.

# ژیاننامەی عەبدولغەنی نابلسی(*)

ناوی شێخ عەبدولغەنی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئەحمەدەو بە(نابلسی)بەناوبانگە.
ل(٥)ی زیلحیجەی ساڵی ١٠٥٠لەدایکبوە لە(دیمەشق)، لەوکاتەدا کەلەسکی دایکیدابوە باوکی لەسەفەری ولاتی(رۆم)بوەو شێخ (محمود)کەلەچیای (قاسیون) نێژراوە مژدەی بەدایکیداوە کوڕیدەبێتو ئەویش یەك درهەمی زیوی دەداتێو شێخ (محمود)یش پێیدەڵێ ناویی بنێ (عەبدولغەنی) ئەم پیاوچاکە بەرلەوەی (نابلسی) لەدایکببێت بەچەند رۆژێك کۆچی دواییدەکات.
باوکی دەیخاتەبەر خوێندنو فێری قورئانو زانیاریدەکات لەساڵی (١٠٦٢)دا باوکی کۆچی دواییدەکاتو (نابلسی) بەهەتیوی گەورەدەبێت، لەسەرجەم زانیارییەکان پشکی خۆی وەردەگرێتو هەر بەمنداڵیش بەرلەوەی باوکی بمرێت ئامادەی وانەکانی باوکیدەبێت کەلەبارەی تەفسیرەوە لەمزگەوتی (ئەمەوی) وانەدەڵێتەوەو ، سەرباری وەرگرتنی زانیاری لەلای زانایانی ناودیاری (دیمەشق)روودەکاتە (میسر)و لەوێش زانستی خواناسیو هەردوو تەریقەتەکە وەردەگرێت.
دوای ئەوەی تەمەنی دەگات بەبیست ساڵو قاڵدەبێت لەخوێندنەوەدا دەتوانێ وانەبڵێتەوەو خولیای خوێندنەوەی کتێبەکانی شێخ (محیدینی عەرەبی)دەبێتو لەگەڵ کتێبەکانی دیکەی سۆفیگەرایەتی.
پاش بەدەستهێنانی زانستێکی بێشومار دەستدەداتە وتنەوەی وانە لەمزگەوتی (ئەمەوی)و لەکۆتایی تەمەنیشیدا بۆماوی حەوت ساڵ لە(سوق

---

(*)مجلة التراث العربي/مجلة فصلية تصدر عن اتحاد الكتاب العرب ـ دمشق العدد ١٠٤ السنة السادسة والعشرون ـ كانون الأول ٢٠٠٦ ذوالحجة ١٤٢٧ ـ كتبه محمود الارناؤوط.

العنبرانيين)جێگیردەبێتو نایەتە دەرەوەو لەو ماوەیەدا زۆر رووداوی سەیریان لەسەر تۆمارکردووە ، دوای هاتنەدەرەوەی خەڵکی بەلێشاو رووی تێدەکەنو خوازیاری فەرو بەرەکەتیدەبن.

لەوساڵانەی کۆتایی تەمەنیدا سەردانی (قودس)و (تەرابلس)و چیای لوبنانەدەکات لەگەڵ سەردانی میسرو (بقاع)و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ (دیمەشق)و لەوێ کۆچی دواییدەکات.

لەکتێبەدانراوەکانی:

١)التحرير الحاوي بشرح تفسير البيضاوي.

٢)كنز الحق المبين في أحاديث سيد المرسلين.

٣)ذخائر المواريث في الدلالة على مواضيع الأحاديث.

٤)جواهر النصوص في حلّ كلمات النصوص للشيخ محي الدين بن العربي.

٥)كشف السر الغامض ـ شرح ديوان ابن الفارض.

٦)زهر الحديقة في ترجمة رجال الطريقة.

٧)تحريك الإقليد في فتح باب التوحيد.

٨)المجالس الشامية في مواعظ أهل البلاد الرومية.

وێڕای کتێبی (خەونامە)ەکەی چەندین نووسراوی دیکەی هەیە کەلێرەدا هەرئەوەندە توانای ئاماژە پێکردنمان هەبوو.

(نابلسی) یەکێبوو لەو زانایانەی کەبەشێوەیەکی بێشومارو بەرین لەسەری نووسراوەو لەهەموو روویەکەوە.

لەرۆژی ٦/شەعبان رێکەوتی ساڵی ١١٤٣ك نەخۆشدەکەوێتو لەعەسری یەکشەممە رێکەوتی ٢٤/ی هەمان مانگدا کۆچی دوایی دەکاتو بەمەرگی غەمو پەژارە دادەبارێ بەسەر خەڵکی (صالحیە)و (دیمەشق)دا.

# ژیاننامەی
# شێخ کەمالەدینی دمیری(*)

یەکێکە لەزانایانی شافعیی و بەزانیاری فتوا ناسراوە لەگەڵ تەفسیرو راڤەی قورئان (عەبدولحەی حەنبەلی لە "شذرات الذهب"دادەڵێت: "لەساڵی ٧٤٢ی کۆچیدا لەگوندی (دمیر) لە(میسر) لەدایکبووەو لەسەردەستی زانایانی سەردەمی خۆیدا زانیاری وەرگرتووەو رۆچوە لەزانستە فرەچەمکەکانداو پشکی خۆی لەهەموو زانیارییەك وەرگرتوە ویڕای زانستی زوبان و ئەدەب و بەڕادەیەك شارەزابوە ئەستێرەی بەرزبوەتەوەو ماوەیەك لە(مەککە)و (مەدینە) نیشتەجێبوەو زۆرکاری کەرامات و لەرادەبەدەری لێدەگێڕنەوەو چەند کتێبێکیشی نووسیوە لەوانە:

١)شرح المنهاج لەچواربەرگدا.

٢)کتێبێکی لەفیقهدا نوسیوە.

٣)کتێبی (الحیوان)ی لەسێبەرگی گەورەو مامناوەندو بچووکدا نووسیوەو تێدا زانایی و دانایی خۆی بەدەرخستوە ، ئەم کتێبەشی لەسەر شێوەی ئەلفبێی عەرەبی رێکخستوەو تێدا ناوی ئاژەڵەکاندەهێنی و باسی تایبەتمەندی و نهێنیی و وابەستەکانیان لەخەودا دەکات.

---

(*) www.islamweb.net

# ا ئەلف



ئـــابڕوو( عـــەورەت ):(ئـيبن سـيرين) دەڵێـت: دەرکـەوتنی عـەورەت شـکانی نهێنـــیو پێخۆشـــبوونی دوژمنانـــە، عـــەورەتیش مابـــەینی نێـــوان نـــاوكو ئەژنۆیە.

*ئەگـــەر بینـــی عـــەورەتی دەرخـــست یاخود جلوبەرگی هـەڵماڵراو دەرکـەوت هـــەمووی یـــان هەنـــدێکی ئـــەوە بەئەندازەی ئەوە دەردەکەوێ.

*ئەگەر جلێکی کەمی پێوەمابوو ئـەوە خۆی لەکارێك کەبەباشـی لێکداوەتـەوە دادەماڵیو دەستدەکێشێتەوە، ئەگـەر ئەوکارە بەڵگەبوو لەسەر ئاین لەچاکیو باشـــیدا دەگاتـــە ئاســـتێك یـــەکلایی دەبێتـــەوەو ئەگـــەر لەسەرپێـــچیدابوو ئـــەوە لەسەرپێـــچیدا بـــەو ئەندازەیـــە ڕۆدەچێت.

*ئەگـــەر لەخـــەودا نـــەیتوانی لێـــبڕێ لەهـــەمان کاتیـــشدا لەسەرپێـــچیکاران نـــەبوو ، عەورەتیـــشی رووتو دیـــاربوو بەچاوی خۆی دەیبینـی شـەرمیدەکردو هەندێك جلو بەرگی پێوەمابوو، وێڕای ئەوە هیچ نەبینرا بەڵگەبێت لەسەر کـــاری چـــاکە ئـــەوە نهێنـــی خـــۆی دەدرکێنیو خێری تێدانییە.

*ئەگەر لێبڕانی بۆ ئاین بەو چەشنەبوو کەباســـکراوو عـــەورەتی دیارنـــەبوو سـوورنەبوو لەسـەر شـەرمکردنو هـیچ جلوبـەرگو پۆشـاکێکی لەبەردانـەبوو لەبەلاو نەهامـەتی قوتـاردەبێ ، ئەگـەر نەخۆشـبوو چـاکدەبێتەوەو خوداوەنـد چارەســـەرو شـیفای دەدات، ئەگـــەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە ، ئەگەر ترسابوو دڵنیادەبێت.

*ئەگـــەر پۆشـــاكو جلوبـــەرگی لەبەرانـەبوو لـەبۆ ئومێـدی ئومێـدداران دەگـەڕێ یـان لەدەستەلات دەخـرێو کـارێکی لەوچەشـنەی دێتـە دەسـتو بەتوندی دەستی پێوەدەگرێت ئەگـەر لەسـەرجەم ئـەو حالانـەدا عـەورەتی دیاربوو وەك شەرمەندەوایە.

*ئەگەر عەورەتی دیارنەبوو شەرمیشی نەدەکرد حاڵگۆڕانی بەسەلامەتی دەبێتو دوژمنانی پێخۆشنابێ.

**ئابلووقە(گەمارۆ)**: (نابلسی) دەڵێت:
گەمارۆو ئابلۆقە لەخەودا بەڵگەیە
لەسەر خۆداگرتنو دانبەخۆداگرتن
لەسەر کاروبارەکان.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زاڵبوونو سەرکەوتن بەسەر موشریكو هاوەڵ پەیداکەراندا.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشییەك بەهۆی ئابلۆقەو گەمارۆوە بڵاوبێتەوە.
**ئاخوڕ**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: عەلەف شکۆمەندییە یاخود هاوسەری پیاوە.
*ئەگەر ئاخوڕێکی لەماڵی خۆیدابینیو دوو ئاژەڵ ئالیکیان تێدا دەخوارد بەڵگەیە لەسەر هاوبەشی دووپیاو لەژنێکدا، یاخود هاوسەرەکەی خۆیەتی یان یەکێکی نێو ماڵەکەیە.
**ئادەم**(عليه السلام): (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی (ئادەم) لەسەر شێوازی راستەقینەی خۆی بەدیبکات ئەوا پلەوپایەیەکی مەزن بەدەست دێنێت گەر شایستەبێت بەڵگەش لەسەری ئایەتی ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾(البقرة:٣٠).
*ئەوەی لەخەودا ببینێت گفتوگۆو وتوێژی لەگەڵ (ئادەم) دەکات ئەوا زانستێك بەدەست دەهێنێت ، بەڵگەش لەسەری ئایەتی : ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾(البقرة: ٣١).

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی (ئادەم) ببینێت هەڵخەڵەتاوە بەوتەی هەندێك لەدوژمنەکانیو رەنگو حاڵیگۆڕاوە بەڵگەیە لەسەر گواستنەوە لەجێگەو شوێنیکەوە بۆ جێگەو شوێنێکیتر ، پاشان گەڕانەوە بۆ جێگەو شوێنی یەکەمجار.
*(نابلسی) دەڵێت: هەرکەسێك لەخەودا (ئادەم) ببینێ ئەوا گوناهێکی ئەنجامداوە با تەوبەی لێبکات.
*ئەوەی ببینێ (ئادەم) لەخەودا سەر دەبڕێت ئەوا ناپاکیو غەدر لەفەرمانڕەوا دەکات یان خراپ دەبێت لەگەڵ دایكو باوكو مامۆستاکەی.
*ئەوەی ببێت بە(ئادەم) (عليه السلام) یان هاوەڵایەتی بکات ئەوا:
+ئەگەر شایستەی دەستەڵات بێت بەدەستی دەهێنێت.
+ئەگەر زانابێت خەڵکی سوود لەزانستەکەی وەردەگرن یان زانستی زیاتر وەردەگرێت.
*هەروەها بینینی (ئادەم) (عليه السلام) لەخەودا دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لێکدەری خەو چونکە (ئادەم) یەکەم کەسبوو خەوی لەدنیادا بینیو دەستەواژەکانی فێربوو.
*هەروەها بینینیبەڵگەیە لەسەر:
+حەجو کۆبوونەوەی خۆشەویستان.
+زۆری وەچەو نەوە.
+هەڵەو لەبیرکردن.

+پیلان و فرو فێڵ.

+تێکەڵبوون لەگەڵ ئەوانەی مار دەگرن و هەڵس وکەوتی لەگەڵدەکەن.

+ئەوەی ژار دروستدەکات.

+ئەوانەی شەیتانەکان کۆ دەکەنەوەو بەناوی ئەوانەوە دەدوێن.

+جل و بەرگی زبرو گریان.

+زۆرخۆری خەوبینەر.

+سەفەرو گەشتێکی دوور کەدەگونجێت بۆ ئەولایەبێت (ئادەم)ی لێدابەزی.

+خوداوەند منالی نێرینە ببەخشێ بەوەی خەوەکەی پێوەبینیوە پتر لەمنالی مێینە.

* ئەگەر خەوبینەر چاوی ئێشی دەکردو نەخۆشبوو قوتارو رزگاریدەبێت لەنەخۆشیەکەی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خزمەتکارو کرنووش بۆ پادشایان.

* ئەوەی(ئادەم) (عليه السلام) بەناتەواوی ببینێت دەگونجێت گەورەو بەرپرسی خەوبینەر حاڵ و باری تێکبچێت یان کاروکاسبی بگۆرێت یان بشێوێت.

* ئەوەی لەحاڵێکی باشدا بەدیبکات خێرو چاکەی گەورەو بەرپرسەکەی بۆ ئەو دەبێت.

**ئارامگرتن( دانبەخۆداگرتن ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی ئارامدەگرێ لەسەر ناڕەحەتی بەرزی و سەلامەتی پێدەدرێ بەپێی ئایەتی: ﴿أولئك يُجْزَونَ الغُرفَةَ بِمَا صَبَرُوا﴾ (الفرقان: ٧٥).

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەرزی و مژدەیە، ئارامگرتن ئاگاداربییە بەڕوودانی بەڵاو نەهامەتی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەرەنجام باشی لەوەی لێی دەترسێ.

**ئاردی سفر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئاردی سفر باشی ئاین و سەفەرە لەچاکەدا بەپێی ئایەتی : ﴿وتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى﴾ (البقرة:١٩٧).

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سەفەرو خواناسی و دنیانەویستی.

* خواردنی حەڵوای ئاردی سفر نزیکییە لەدەستەلاتدارو قوتاربوونە لەزیندان، یاخود کردارێکی چاکە شایستەی ئازادبوون و سەرفرازییە لەئاگری دۆزەخ.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بوونی وێڵی و سەرگەردانی.

**ئارەزوو( حەز ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئارەزوو: کورە، گوتراویشە پیاوێکە کاروباری خەڵکی بەجێدەهێنێ.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا کوڕە یان نوێنەرە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەر کەوا ماوەکەی دوورودرێژە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بۆ یەکێك زەفەری پێببات بەڵگەیە لەسەرکرداری دۆزەخیەکان، ئەو ئارەزووەی لەرووخسارو لەشولاردا دیاریدەدات بەڵگەیە لەسەرئەوەی بەگوناهی کەسانیتر تاوانباردەکرێ.

**ئارەقکردنەوە( ئارەقدەردان ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر زیان لەدنیادا، هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی ئارەق دەردەدات ئەوە پێداویستی خۆی بەجێدەهێنێ، بۆگەنی عارەقی بنباخەڵ بەڵگەیە لەسەر روپامایی بۆ ژێردەستەکانو بۆ دەستەڵاتداریش بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی ماڵو سامان لەپیاهەڵدانو ستایشی خراپدا.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا لەش ساغییە بۆ نەخۆش ئەگەر خوازیاری بێت، وەگەرنا ئارەقی مردنەو، بۆ کەسێکی لەشساغیش خزمەت یان پیشەیەکە ناڕەحەتی تێدا بەسەردێت.

* ئارەق ماڵو سامانە ئەگەر بینی ئارەقی دەرکردوە ماڵو دارایی بەئەندازەی ئەو ئارەقە دەردەکاتو دەگونجێت ئارەق ماندوبوون بێت.

**ئارەوەن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: درەختی ئارەوەن بەڵگەیە لەسەر منداڵ.

* هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژیو ئارامگرتن لەسەر شتومەكو سوود وەرگرتن ئەمەش بەهۆی درێژییەوە.

* هەروەها دەڵێن: دارسنەوبەر بۆ کەشتیەوانو ئەوەی کەشتی لێدروستدەکات بەڵگەیە لەسەر بەدەرخستنی حاڵو باری کەشتی.

* هەندێکدەڵێن: ئارەوەن بەڵگەیە لەسەر کوڕێکی رێزدار.

**ئازادکردن:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بێزاریو نیگەرانی نێوان کۆمەڵێکە، ئازادکردنیش بۆگەردنو ئەستۆیە.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر نیگەرانی بەرژدو بەخیلیو خوداوەند دەفەرموێ: ﴿فَكُّ رَقَبَةٍ (١٣) أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ(١٤) ﴾ (البلد) .

* هەروەها دەڵێن: ئازادکردن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر قوربانی، ئەگەر بینی ئازاد دەکات قوربانیدەکات.

* ئەگەر ژنەکەی ئازادکرد تەڵاقیدەدات.

* ئەگەر کەسێکی ئازادی بینی ئازادکراو قەرزاریشبوو خوداوەند قەرزەکەی دەداتەوە یاخود لەگوناهو تاوانی خۆشدەبێ.

**ئازاردانی دایكو باوك:** (نابلسی) دەڵێت: ئازاردان لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گوناهی گەورەی وەك هاوەڵپەیداکردن بۆ خوداوەندو کوشتنی کەسێك بەناحەقو کاری دیکە.

* ئازاردانی پیاوخراپو دوورکەوتنەوە لەهاوەڵانی خراپ بەڵگەیە لەسەر خواناسیو نزیکبوونەوە لەخوداوەند بەوەی پێی رازییە.

**ئاسانکاری هەرس**[1]: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ئەگەر تامی خۆشبوو بەڵگەیەلەسەر: رەواندنەوەی غەمو پەژارەو نەخۆشی.

**ئاسانی (سووکی)**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دژی قورسیو گرانییەو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خواناسی بەپێی ئایەتی: ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا﴾(الطلاق: ٤).

**ئاسك (مامز)**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ژن یان منداڵ نێرینەو مێینەیە.

* ئەگەر ئاسکی راوکرد یاخود بەدیاری بۆی نێردرا یان کڕی رزقو رۆزی بەدەستدەهێنێ یاخود هاوسەر دەگرێ ئەگەر رەبەنبێتو یان کوڕێکی دەبێ یان زاڵدەبێ بەسەر دوژمنو نەیارەکەیدا.

* ئەگەر بینی ئاسکێکی هێنا ئەوە میراتیو خێرێکی زۆر بەدەستدەهێنێت، ئەگەر چاوەڕێی منداڵبوو کوڕی دەبێت.

* ئەگەر ئاسکێکی سەربڕی ئەوە دەچێتە لای کچێك ئەگەر کردی بەماڵەکەی خۆیدا ئەوە ژن بۆ کوڕەکەی دەهێنێت.

* ئەگەر لەپێستەکەی داماڵی داوێنپیسی لەگەڵ ژنێکی عەرەبیدا ئەنجامدەدات.

* ئەگەر ئاسکێك بازیدا بەسەریا ئەوە هاوسەرەکەی سەرپێچیدەکات لەهەموو شتێکدا.

* ئەگەر بوو بەخاوەنی ئاسك دەبێت بەخاوەنی ماڵێکی حەلاڵ یان ژنێکی ڕێزداری ئازاد دەهێنێ.

**ئاسکی مێیینە**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئاسکی مێینە کچێکی عەرەبی جوانە، ئەگەر بینی ئاسکێکی مێنەی راوکرد ئەوە دەستی ژنێك دەبڕێتو دەیهێنێت.

* ئەگەر بینی بەردێکی گرتە ئاسکێکی مێینە بەڵگەیە لەسەر تەلاقدانی ژنەکەی یان لێدانی یاخود جووتبوون لەگەڵ کچێکدا.

* ئەگەر بینی تیرێکی تێگرت ئەوە کچێك توممەتباردەکات.

* ئەگەر ئاسکێکی مێنەی سەربڕیو خوێنی لێهات ئەوە کچێك سزا دەدات.

* ئەگەر بوبوو بەئاسك خۆشیەکانی دنیا بەدەستدەهێنێ.

* ئەگەر ئاسکێکی گرت میراتیەکی زۆر بەدەستدەهێنێ.

---

[1] **ئاسانکاری هەرس**: دەگونجێت دەرمانبێت یاخود هەر خواردنو پێکهاتەیەك کاری هەرس ئاسانبکات.

(وەرگێڕ)

*ئەگەر بینی بەشوێنی ئاسکێکدا ڕۆیی هێزو توانای زیاددەکات.
*هەروەها دەڵێن: ئەوەی بوو بەئاسك دەروون و حاڵی گوشاد دەبێت.
*ئەگەر ئاسکی لەماڵی خۆیدا دەرهێنا ژن بۆ کوڕەکەی دەهێنێت، ئەگەر ژنەکەی دووگیانبوو کوڕێکی دەبیّ، ئەگەر پێستی ئاسکێکی داماڵی بەزۆر زینا لەگەڵ ژنێکدا دەکات.
*دەگێڕنەوە پیاوێك لەخەودا دەبینیّ بوە بەخاوەنی ئاسك، خەوەکەی بۆ ڕاڤەکارێکی خەو دەگێڕێتەوە، ئەویش دەڵێ: ماڵو سامانێکی حەلاڵت دەبیّ یان ژنێکی ڕێزدار، لێکدانەوەکەشی بەم چەشنەبوو.
*ئەگەر تیرێکی گرتە ئاسکێك هەوڵی بەدەستهێنانی دەستکەوت دەدات.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی بوە بەئاسك ئەوە لەکۆمەڵی موسوڵمانان جیادەبێتەوە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی ئاسکیکی برد میراتیو خێرێکی زۆری بۆ دەمێنێتەوە، ئەگەر ئاسکێکی مارەبڕی ئەوە بەزۆر زینا لەگەڵ ژنێکدا دەکات.
*خواردنی گۆشتی ئاسك بەدەستهێنانی ماڵو داراییە لەژنێکی شۆخو شەنگەوە.
*ئەگەر بینی ئاسکێکی کوشت یان بەدەستیەوە مرد غەمو پەژارە ڕووی تێدەکات لەلایەن ژنانەوە.

*(دمیری)دەڵێت: مرۆڤ چەند سەرئاسكو کەللەسەرو مێشکەکەی هەبێت ماڵوداراییە لەلایەن ژنەوە.

**ئاسمان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئاسمان بەڵگەیە لەسەر خۆی، ئەوەی لەئاسمانەوە یان لای ئەوەوە دابەزی ئەوە لەلایەن پەروەردگارەوەیەو دروستکراو هیچ دەستێکی تێدا نییە وەك ئەوەی ئاگرێك بێتەخوارەوە خەڵکی تووشی نەخۆشیو گەڕیو مەرگ بکات.
*ئەگەر ئاگری لێهاتەخوارەوە بەسەر بازاڕدا نرخی کالاّو شتومەك بەرزدەبێتەوە.
*ئەگەر بەسەر کێڵگەو شوێنی کشتوکالا دابارییو زیانی بەخەڵکی دەگەیاند سەرماو کوللە دادەباریّ بەسەر کشتوکاڵدا.
*ئەگەر شتێکی لێباری بەڵگەبوو لەسەر ڕزقو ڕۆزییو ماڵو دارایی وەك هەنگوینو زەیتونو هەنجیرو جۆ ئەوە بارانێکی بەسوودو قازانج دەباریّ بەسەر خەڵکیداو سوودی لێوەردەگرن.
*دەگونجێت ئاسمان بەڵگەبێت لەسەر شەرمو خۆپارێزی دەستەلاّتدار بەهۆی پلەوپایەو نەتوانینی خەڵکی بێدەستەلاّت لەوەی دەربچن لەچنگو دەستەلاّتی ستەمکارێك.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کۆشكو لانەی دەستەلاّتو گەنجینەی، ئەگەر

بەپلیکانە یان بەهەر هۆکارێك سەربکەوێ روو بەئاسمان لەگەڵ پلەوپایەدا شکۆمەندی بەدەستدەهێنێتو بەختی دەبێت، ئەگەر بەبێ هیچ هۆکارێك سەرکەوت ترس‌و بیمێکی زۆر لەدەستەڵاتدارەوە رووی تێدەکات.

*ئەگەر گەیشت بەئاسمان دەگات بەچلەپۆی داواو خوازی خۆی ، ئەگەر گەڕایەوە بۆسەر زەوی قوتار دەبێت لەوەی چوەتە نێوی.

*ئەگەر لەشوێنی خۆی کەوتە خوارەوە یەکی دەکەوێت لەشوێنی خۆی بەئەندازەی کەوتن‌و هەڵنوتانی لەگەڵ ئەو ئەندامەی دەشکێ.

*ئەگەر ئەوەی دەگاتە ئاسمان لەکاتی بێداریدا نەخۆشبوو ، پاشان نەگەڕایەوە بۆسەر زەوی دەمرێت‌و رووحەکەی روو بەئاسمان بەرزدەبێتەوە ، ئەگەر گەڕایەوە بۆسەرزەوی زیاندەکات‌و کەسوکاری ناهومێد دەبن لێی ، پاشان خوداوەند قوتاریدەکات ، مەگەر لەکاتی دابەزینیدا بکەوێتە نێو بیرێك یان چاڵێك‌و پاشان لێی نەیەتە دەرەوە ئەمەش گۆڕەکەیەتی کەوا دەخرێتە نێوی دوای گەڕانەوەی، مژدەی تێدایە بەمردن لەسەر موسوڵمانێتی چونکە بێباوەڕان دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ئاوەلا ناکرێ‌و روحیان بەرزنابێتەوە.

*هەروەها بینینی دەرگاکان دەگونجێت ئەگەر زۆربێت بەڵگەبێت لەسەر سوود ، ئەگەر خەڵکی تێدابوو یاخود هەنگو چۆلەکە بەدیار چاوییەوە سەرکەوتن بەوچەشنەیە. هەروەها ئەگەر خەڵکی لەقات‌وقڕیدابوون بارانێکی زۆریان بۆ دەبارێت خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُنْهَمِرٍ ﴾ (القمر:١١)بەتایبەت ئەگەر ئەوەی لێدابەزی بەڵگەبوو لەسەر سۆزو بەزەیی‌و فەڕ وەك خاك‌و خۆڵ بەبێ تەپو تۆزو زیان.

*بەڵام ئەگەر لەئاسمانەوە خەڵکی تیربارانکران ئەگەر هەندێك بەڵگەی تێدابوو ئەوە دەروازەکانی نەخۆشی سەخت‌و گران دەکرێتەوە بەسەریاندا، ئەگەر تیرەکان برینداریاندەکردو خوێنیان دەڕژاند دەستەڵاتدار بەهەر تیرێك کەسێك دەستگیردەکات، ئەگەر تیرەکان ئاڕاستەی گوێچکەو چاوکران ئەوە فیتنەو ئاشووبە، ئەگەر تیرەکان کەوت بەسەیانداو هیچ زیانێکی نەبوو کۆیانکردەوە ئەوە دەسکەوتە لەلایەن خوداوەندەوە پێیان گەیشتوە وەك فەڕوبەرەکەت‌و جۆرەکانی باڵندە.

*نزیکبوونەوەی ئاسمان بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونەوەی لەپەروەردگار بەپێی گوتەی پەروەردگار لەفەرموودەیەکی قودسیدا" ئەوەی بستێك لێم نزیکببێتەوە باڵێك لێی

نزیکدەبمەوە " ئەمەش بۆ خەڵکی گوێڕایەڵو کرداری باشو چاکە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کەسێکی پەرێشانی ناچار خوداوەند دوعاکەی قبوڵبکات، چونکە ئاماژەکردن لەکاتی دوعادا بەچاوە روو بەئاسمان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نزیکبوونەوە لەزاناو ئیمامو باوكو كوڕو هاوسەرو گەورە هەریەکێك لەسەرووی بێت بەپلەی ڕێزو چاکەو هیمەت لەکاتی بێداریدا.

*رمانی ئاسمان بەسەر زەویدا دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تیاچوونی دەستەڵاتدار ئەگەر نەخۆشبێت، هەروەها بەڵگەیە لەسەر چوونی روو بەو زەوییە ئەگەر لەسەفەردا بێت، هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ دەستەڵاتداریی خەوبینەرو ئەوەی لەسەرو ئەوەوەن لەسەرۆكو باوكو مێردو گەورە.

*دەگونجێت رمانی بەسەر زەوییەکی وشكو بێ ئاودا یان زەوییەك خەڵکی بەقاچ بیشێلن دوای رمانیو سوپاسگوزاری دەربڕن بارانی بەسوودو کەڵکبێت ، عەرەبیش باران بەئاسمان ناودەبات چونکە لەئاسمانەوە دادەبەزێت.

*ئەگەر ئاسمان بکەوێت بەسەر خەوبینەردا یان بەسەر خانەوادەکەیدا بەڵگەیە لەسەر رمانی سەربانی ماڵەکەی بەسەریا ، چونکە خوداوەند ئاسمانی بەسەربانێکی پارێزراو ناوبردوە، ئەگەر ئەوەی سەربانەکە روخاو کەوت بەسەریا کەسی نزیکی نەخۆشبوو لەحاڵی بێداریدا ئەوە دەمرێتو بەپشتا دەخرێتە نێو گۆڕەکەی ئەگەر لەژێر داروبەردی رووخاودا دەرنەهێنرا.

*ئەگەر سەرکەوت بەئاسماناو چوو بەنێویدا گەواهیو رێزو نزیکی خوداوەند بەدەستدەهێنێت لەگەڵ ناوبانگو شکۆمەندی.

*ئەگەر بینی لەئاسماندایە فەرمانبەچاکەو رێگری لەخراپە دەکات.

*هەروەها دەڵێن: ئاسمانی دنیا وەزارەتە، چونکە شوێنی مانگەو مانگیش وەزیرە ، ئاسمانی دووەمیش ئەدەبو زانیاریو زیرەکیو سەرکردایەتییە، چونکە ئاسمانی دووەم بۆ هەسارەی (عەتارد)ە.

*ئەگەر بینی لەئاسمانی سێیەمدایە نیعمەتو خۆشحاڵیو خشڵو زێرو راخەرو دەوڵەمەندی بەدەستدەهێنێت، چونکە رێگەی ئاسمانی سێیەم رێگەی(زەهرە)یە.

*ئەگەر خۆی لەئاسمانی چوارەم دییەوە ئەوە موڵكو دەستەڵاتو هەیبەت بەدەستدەهێنێت یاخود دەچێتە خانەی کرداری پادشاو دەستەڵاتدار چونکە خولگەی ئاسمانی چوار هی(خۆرە).

* ئەگەر خۆی لەئاسمانی پێنجەم دییەوە دەستەڵاتو سەرپەرشتی پۆلیسی پێدەدرێ یاخود پیشەیەك کەوا دەدرێتە پاڵ هەسارەی (مەریخ) چونکە خولگەی ئاسمانی پێنج هی (مەریخ)ە.
* ئەگەر خۆی لەئاسمانی شەشدا دییەوە خێری دەستگیر دەبێت لەکڕینو فرۆشتندا ، چونکە خولگەی ئاسمانی شەش هی هەسارەی (موشتەری)یە.
* ئەگەر خۆی لەئاسمانی حەوتەم دییەوە زەویو زارو کشتوکاڵی دەستگیر دەبێت لەگەڵ پلەوپایە لەسوپادا چونکە خولگەی ئاسمانی حەوتەم هی (زوحەل)ە.
* ئەگەر خاوەنی ئەوخەوە شایستەی ئەو پلەوپایانەبوو لێکدانەوەکەی بۆ سەرۆك یان جێگیر یاخود هاوشێوو هاو ناویەتی.
* ئەگەر خۆی لەسەروو حەوت چینەی ئاسمانەوە بینی ئەوە پلەوپایەی مەزنی دەستگیر دەبێت بەلاَم تیادەچێت.
* ئەگەر بینی ئاسمان سەوز هەلگەڕاوە بەلگەیە لەسەر زۆری کشتوکاڵ لەوساڵەدا.
* ئەگەر بینی ئاسمان بوە بەئاسن باراندەبارێت.
* ئەگەر بینی لەئاسمانەوە پیسایی دەکات بێباوەڕدەبێت ، ئەگەر ئاسمان شەقیبردو ریش سپییەکی لێهاتە دەرەوە وشکیو بێفەڕی ئەو زەوییەیە.
* ئەگەر لاوێکی لێهاتە دەرەوە دوژمنێکە بەدەردەکەوێتو خراپە دەگەیەنێت بەخەڵکی ئەو شوێنەو دژایەتیو ئاژاوە دروستدەکات لەنێوانیاندا.
* ئەگەر مەڕی لێهاتەدەرەوە دەستکەوتە.
* ئەگەر حوشتری لێهاتەدەرەوە بارانیان بۆدەبارێو لافاو هەڵدەستێ.
* ئەگەر دڕندەیەکی لێهاتدەرەوە بەزوڵمو ستەم تاقیدەکرێتەوە لەلایەن دەستەلاَتدارێکی ستەمکارەوە.
* ئەگەر ئاسمان بوو بەیەك پارچەی یەککگرتوو باران نابارێ بۆیان ، ئەگەر هەڵوەشا باران زۆر دەبارێ.
* ئەگەر بینی ئاسمانی لەکیسچوو کارێکی مەزن ئەنجام دەدات بەلاَم بۆی بەدینایەت.
* تەماشاکردنی ئاسمان روانینە بۆ یەکێك لەفەرمانڕەواو دەستەلاَتدارانی دنیا ، ئەگەر تەماشای لای رۆژهەلاَتیکرد سەفەرە ، دەگونجێت دەستەلاَتێکی مەزن بەدەستبهێنێت.
* ئەگەر بینی ئاسمانی دزیو لە کوپەیەکدا شاردیەوە، ئەوە قورئانێك دەدزێو دەیدات بەژنێك.
* ئەگەر بینی سەردەکەوێت بەئاسماندا بەبێ ناڕەحەتی ئەوە دەستەلاَتو

نیعمەت بەدەستدەهێنێتو دڵنیادەبێت لەفرۆفێڵی دوژمن.

*ئەگەر بینی بەددانەکانی قەپیکردوە بەئاسماندا بەلاّو نەهامەتیەك روودەکاتە نەفسی یاخود کەمو کورِی لەماڵو ساماندا دروستدەبیّو خوازیاری شتێکدەبێت دەستی پێناگات.

*ئەگەر چوە نێو ئاسمان بەلاّم لێی ناهاتە دەرەوە ئەوە دەمرێت یاخود نزیکدەبێتەوە لەمردن.

*ئەگەر بینی لەئاسماندا خولدەخوات پاشان دادەبەزێ ئەوە فێری زانستی ئەستێرەناسیو زانستی نادیار دەبێتو لەنێو خەڵکیدا باسدەکرێ.

*ئەگەر بینی پاڵیدایەوە پێوەی ئەوە پلەوپایەو سەرکردایەتی بەسەر نەیارو دوژمنانیدا بەدەستدەهێنێت.

*دەگێرنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: سێکەسم بینی نەمدەناسین ، یەکێکیان بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان ، پاشان ئەویتر لەنێوان ئاسمانو زەویدا بەندکرا ، ئەوی دیکەش بەرووداکەوتو کرِنووشی برد (ئیبن سیرین)یش دەڵێت: ئەوەی بینی بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان ئەمانەتو ئەسپەردەیە لەنێوان خەڵکیدا هەڵدەگیریّو نامێنیّ، ئەوەشی زیندانیو بەندەکریّ لەنێوان ئاسمانو زەویدا سۆزو بەزەییو رەحم دەبچرِیّ، ئەوەشی کرِنووشدەبات نیشانەکانی کۆتایی دنیا دادێت.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی لەئاسمانەوە دابەزی رووبەزەوی نەخۆشیەکی سەختو توند لێیدەداو مەترسیەکی گەورە رووی تێدەکاتو لەلێواری مردن نزیکدەبێتەوە پاشان قوتاردەبیّ.

*ئەگەر بینی دەستی لەئاسماندایە کارێکی مەزنو گەورە دەستپێدەکات بەلاّم بۆی تەواو ناکریّ.

*ئەگەر بینی بەرزبووەوە هەتا لێی نزیکبووەوە بەبیّ ئەوەی بەدەستی بهێنێت ئەوە خاوەن ئاین یاخود دنیایەو پلەوپایەی بەرزی تێدا بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر یەکێك لەمیرو فەرمانرِەوایان تەماشای ئاسمانیکرد بەلای رۆژهەلاّتو رۆژئاوادا دوای ئەوە سەفەردەکات، دەگونجێت دەستەلاّتێکی گەورەش بەدەستبهێنێت.

*ئەگەر بینی ئاسمان ئاوەلاّبوو ئەوە خۆشیو شادیو خێرو نیعمەتی دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر بەرِێکی سەرکەوت بەرەو ئاسمان ئەوە زەرەرو کەمی روودەکاتە لەشو لارو ماڵوسامانی.

*ئەگەر خۆی لەئاسماندا دییەوەو نەیزانی کەی سەرکەوتوە بۆ ئاسمان ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە - پشت بەخودا-.

*ئەگەر بینی بینایەکی هەیە لەئاسماندا لەبینای خەڵکیترو ئەوانەی

زەوی ناچێت ئەوە بەناڕەزایی لەدنیا دەردەچێ.

*ئەگەر بینایەکی دی لەنێوان زەوی‌و ئاسمان ئەگەر لەوەبوو کەوا رقی لەناوەڕۆکی دەبوەوە خراپەیە لەئایندا وەگەرنا ڕێزو شکۆیە لەئاین‌و دنیادا.

*ئەگەر بینی دەرگایەکی ئاسمانی بۆ ئاوەلاکرا بۆ خۆی‌و سەرجەم خەڵکی دەرووی خێرە.

*ئەگەر بینی لەئاسمان کەوتەخوارەوە ئەگەر دەستەلاتداربوو ئەوا پۆستی دەستەلاتی لێدەکرێتەوەو کاروباری بۆ بەجێنایەت.

*ئەگەر هەلۆیەك یا بازێکی بینی فڕی روو بەئاسمان‌و نەکەوتەخوارەوە خێری دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر بینی بەپەتێك لەئاسمانەوە هەلواسراوە دەستەلاتی لەئایندا دەستدەکەوێ بەئەندازەی دوورکەوتنەوەی لەزەوی.

*ئەگەر بینی پەتەکە بچڕا دەستەلاتەکەی بەسەردەچێت.

*ئەگەر چرایەکی لەئاسمان ببینی دەدرەوشێتەوە کوژایەوە خۆر دەگیرێ.

*ئەگەر بینی بەدیارچاوی خۆیەوە ئاسمان بینادەکرێ گەواهی‌و شەهادەی درۆ دەدات بەپێی ئایەتی: ﴿مَا أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ (الكهف : ٥١).

*ئەگەر بینی لەئاسمانەوە پیساییدەکات گوناهێکی گەورە ئەنجامدەدات، ئەگەر سەری دانەواندبوو لەکاتی کەوتنیدا بەلگەیە لەسەر تەمەندرێژی.

*دەگونجێت ئاگاداریش بێت بۆئەوەی کەوتوەتە نێو گوناهوتاوان‌و، بەلگەبێت لەسەر بشێوی نەخۆش دوای پشوودانی‌و پەشیمانبوونەوەی تەوبەکارو گەڕانەوەی یان بەرزبوونەوەی کەسانی نزم‌و سووك بەسەرکەسانی بەرزو بالا لەخانەوادەی خۆی.

*ئەگەر بینی ئاسمان رووناکی لێهاتە دەرەوە بەلگەیە لەسەر ڕێنومایی خەلکی ئەو شوێنە، ئەگەر تاریکایی لێهاتەدەرەوە بەلگەیە لەسەر وێلی‌و سەرگەردانیان.

*ئەگەر قامچییەکی بینی لەئاسمان هاتە خوارەوە خەلکی تووشی بەلاو نەهامەتی دەبن بەهۆی ئەو گوناهانەوە کەئەنجامیانداوە.

*بینینی ئاسمانەکان بەلگەیە لەسەردەرخستنی راستی بۆ خاوەن هیمەتی بەرزو گرنگیدان بەکاروباری پاشەڕۆژ.

*دەگونجێت بینینی بەلگەبێت لەسەر سەفەر بۆ شارەگەورەکان‌و بازرگانیکردن بەشتومەکی دەگمەن‌و سوودهێنەرەوە لەدەریاو رووبارەکاندا.

*دەگونجێت ڕۆچوون بەنێو ئاسمانداو بڕینی بەلگەبێت لەسەر خراپی بیروباوەڕو درۆکردن یاخود حەقبێژی.

*بینینی ئاسمان بەلگەیە لەسەر:

+شارو قەلا.

+مالو لانەو هاوسەرو کوڕو دایكو مامۆستا.

+ئەو شوێنانەی خوازیاری سوودەلێوەیو دەترسێت لەمەترسیەکانی.

+سوێند بۆ یەکێك لەخەودا ببینیٚ بەپێی ئایەتی: ﴿والسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ﴾ (الذاريات: ٧)هەروەها ئایەتی: ﴿والسَّمَاءِ والطَّارِقِ﴾ (الطارق: ١).

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر ساختمانو بینایەکی سەیر.

*دەگونجێت دەرکەوتنی ئاسمان بەلگەبێت لەسەر هەولدان لەرزقو رۆزیداو ئاسانکردنی ئەوەی خوازیاریەتیو بەجێهێنانی بەلێنو پەیمان.

*دەگونجێت ئاسمان بەلگەبێت لەسەر دەریاو دروستکراوانی پەروەردگار.

*بینینی ئاسمان بۆ کشتیاران بەلگەیە لەسەر کشتوکالو بەرووبوم.

*ئاسمان بەلگەیە لەسەر ئەوەی بەسەرەوەیە لەکلاوو خودەو..

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر مەرگ بۆ یەکێك لەئاسمان بێتەخوارەوە ئەگەر پیایدا هەلژنا.

*هەروەها بەلگەیە لەسەر بەرزیو بلندی.

*ئەگەر ئاسمانی بینی شەقیبرد بەلگەیە لەسەر بیدعەو وێلیو سەرگەردانی.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر (حەج)و دابەزین لەئاسمانەوە بۆ سەرزەوی بەلگەبێت لەسەر ئاشتەوایی لەگەل دژومناندا.

*ئەوەی لەئاسمانەوە دادەبەزیٚ بەخێردادەنریٚ وەك نانو جۆو هەنگوینو ڕۆنو خەبینەر خێری پێدەگاتو رزقو رۆزییەکی باش بەدەستدەهێنێت ئەوەشی مارو دوپشكو شتەخراپەکانی بۆ دابەزی ئەوە خەمو پەژارەو بەلاو نەهامەتی روو دەکاتە نەفسی لەگەل بەلاو نەهامەتی ماددی.

*ئەگەر ئاسمان ئەو شتانەی دەرخست کەوا خێرداره ئەوە بەلگەیە لەسەر گرانی نرخو لەدەستدانی کەسانی سالحو باشو مەرگی تێکۆشەران ، ئەگەر شتی خراپیدەرکرد ئەوە بەلگەیە لەسەر تێلچوونی بێباوەڕان یاخود کۆتلیی هلتنی زولمو ستەم.

*دەگونجێت چوونە نێو ئاسمان لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر چوونە نێو کۆشکی گەورە پیاوو ناودارانو ئەگەر شتێکی لێوەرگرت بەڵگەیە لەسەر سیخوڕیو خۆداگرتن ، بەسەرپێچییەوە چوە نێوی دەمرێت ، ئەگەر بێباوەڕبوو ئەوە ڕێنومایی دەکرێت، ئەگەر داواکارییەکی لەسەربوو لەشوێنێك وندەبێت کەوا کەس پێی ناگات، ئەگەر نەخۆشیشبوو کۆچی دوایی دەکات یاخود دەگونجێت سەفەربکات بۆ شوێنێکی دوور.

*ئەگەر خزمەتگوزارانی دیاریدەکرد خزمەتی دەستەڵاتداران دەکاتو زاڵدەبێت بەسەریانا.

*دەگونجێت ئاسمان بەڵگەبێت لەسەر زیندانو دەرهاتن لێوەی بەڵگەبێت لەسەر بەرزی ئیرادەو هیمەت.

**ئاسن:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: خوای گەورە دەربارەی ئاسن دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾ (الحديد : ٢٥) ئاسن ماڵو هێزو شکۆمەندییە ؛ خواردنی ئاسن لەگەڵ نانداچاودێریو ئارامگرتنە لەپێناوی بژێویدا، زمان هێنانو بردنە بەغەیبەتو باسکردن، هەروەها ئاسن سەرکەوتنو زەفەر پێبردنە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (جەعفەری صادق) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: لەخەودابینیم وەك ئەوەی پەروەردگارم، ئاسنم پێبدات لەگەڵیا سرکەی دەرخواردام، ئەویش پێی وت: تۆ کوڕەکەت فێری پیشەکەی (داود) (سەلامی خوای لێبێت) دەکەیت.

(نابلسی)دەڵێت: ئاسن لەخەودا ماڵو هێزە بۆ یەکێك ببینێ لەدەستیدایەو شکۆمەندییە دوای لاوازی ئەگەر بیگرێت بەدەستەوە یان تەماشای بکات.

*ئەگەربینی ئاسن دەخوات سەرکەوتوودەبێت بەچەشنو شێوەی خۆی.

*ئەگەر ئاسنی لەگەڵ نانداخوارد چاودێری دەکاتو ئارام دەگرێت بەهۆی سەختی بژێویو ڕزقو ڕۆزییەوە، ئەگەر بەددانەکانی گازی لێگرت باسکردنو غەیبەتو زینایە.

*ئەگەربینی ئاسنێکی زۆر لەگەڵ قوڕقوشمو زێڕ بەدەست دەهێنێت خێروخۆشی ژیانی دنیای دەستدەکەوێت لەگەڵ هێزو دەستەلا بەسەر ئەو ژنەدا کەدەیەوێت.

*ئەگەربینی ئاسنو مس لەبۆتەو قاڵب دەدات ئەوە کاروکردارێك ئەنجام دەدات تواناو دەستەڵاتی بەسەریا دەشکێ.

*ئەگەر بینی ئاسن دەتوێنێتەوە دەکەوێتە بەر زوبانی خەڵکیو غەیبەتو باسیدەکەن.

*ئەوەی لەئاسن دروستدەکرێت سوودو قازانجو هێزە بۆ مرۆڤ لەپاچو

شتیتری بەسوود بۆ مرۆڤ ، ئەوەی چاکە یان خراپەی تێدابێت ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ لێکدانەوەو راڤەکردنی.
*ئەگەر لەخەودا ببینێت بوە بەخاوەنی ئاسن رزق و رۆزی بەماندوێتی دەستدەکەوێت.
**ئاسنگەر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئاسنگەر فەرمانڕەواو پادشایەکی بەسام و هەیبەتە بەئەندازەی هێزو لێزانین و شارەزایی لەکاروبارەکانیدا.
*بەڵگەیە لەسەر پێویستی بوونی خەڵکی پێی گەرچی دەزگای ئاسنگەریش لەژێر دەستدایە.
*دەزگای ئاسنگەریی پادشاو فەرمانڕەوایەو ئاسنیش سەرو هێزێتی.
*ئەگەربینی بوە بەئاسنگەو لەئاسن ئەوەی دەیەوێت دروستیدەکات موڵك و دەستەڵاتی مەزن بەدەستدەهێنێت بەپێی چیرۆکی (داود) - سەلامی خوای لێبێت - ﴿ والنا له الحديد ﴾.
*دەگونجێت ئاسنگەر بەڵگەبێت لەسەر هاوەڵایەتی سەربازان بۆجەنگ، چونکە ئاگر جەنگەو چەکەکەشی لەئاسن دروستکراوە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پیاوخراپ کەوا رەفتارو کرداری دۆزەخیەکان ئەنجام دەدات، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هاوڕێی خراپی بەئاسنگەر ناوزەدکردوەو ئەگەر مەردوم نەسووتێنێ بەئاگر پریشکی ئاگرەکەی بەردەکەوێ.

*ئەگەر لەخەودا گوترا: فلانەکەس پارەیداوە بە ئاسنگەر یان کاروبارەکانی دەباتە بەردەستی لەگەڵ پیاوێکدا دادەنیشێت کەوامیچ خێرێکی تێدا نییە.
*ئەگەربینی بوە بەئاسنگەر ئەوە لەسەر ئەو باروتەرزە پێدەگات.
(نابلسی)دەڵێت: ئاسنگەر فریشتەی روحکێشانە، ئاسنیش هێزو رەقی و زبرییەتی بەپێی ئایەتی: ﴿وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾(الحديد:٢٥). سوودیش شتومەك و قاپ و قاچاغە كەوا مرۆڤ سوودی لێوەردەگرێت ، سزاش نەرمبوونی ئاسنە لەدەستداو دروستکردنی ئەوەی دەیەوێت لەپاچ و شمشێرو چەقۆو شتیتر.
*ئەگەربینی بوە بەئاسنگەرو ئاسنی بۆ نەرمبوەو ئامرازو ئامێری لێدروستدەکات ئەگەر لەوانەبوو کەوا شایستەی دەستەڵاتبوو دەستەڵات و فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت و بەشان و باڵی باوباپیریدا هەڵدەدەن.
*ئاسنگەری نادیار فەرمانڕەوایەکی مەزنە یان دەبێت بەخاوەنی شتێك بەئەندازەی هێزو توانا شکانی بەسەر ئاسندا.
*بینینی ئاسن بەڵگەیەلەسەر:
+غەم و پەژارەو نەهێشتنی هەڵس وکەوت بەشتێکەوە.

+ئاسانبوونی کارو باری قورس.
+ئــــەوەی بـــــەئاگر دەژی وەك چێشتلێنەرو نانەواو هاوچەشنەکانیان.
*ئـــەوەی بـــچێتە ژوورەوە بـــۆلای ئاســنگەرێكو لای دابنیــشێت ئەگــەر نـەخۆش یامردووبێـت دەچێت بـەرەو ئـاگر بەتایبـەت ئەگـەر رووی رەشبوو بەرەو زیندان بەرێکرا.
ئاش: (نابلسی) دەڵێـت: ئـەو ئاشـەی دانەوێڵـەی تێـدا دەهاڕدرێت بەڵگەیـە لەسەر:
+لانـەی زانیـاری کـەوا حـەقو ناحـەقی تێدا جیادەکرێتەوە.
+لانەی داد.
+رزقو رۆزی.
+هاوسەر.
+غەمو پـەژارەو سینە تـەنگیو سـەر شکان.
+ئاودێر.
*ئەگـەر ئـەو ئاشـە مرۆڤـی دەهـاڕی بەڵگەیە لەسەر فیتنەو بەهەدەرچوونی خوێن.
*ئەگـەر لەخـەودا شـتێکی هـاڕی کەنەدەخورا بەڵگەیە لەسەر نـەبوونیو نرخگرانی.
*ئەگەر ئاردەکەی زۆربوو گەنجینەکانی پڕکــرد بەڵگەیـە لەســەر رزقو رۆزیو نــەفسونماو بڵاوبوونــەوەی چارەســەر لەنەخۆشی.
*ئاشـی تـووترلەو قـەوزەو تـەرمۆسو خەنەو هاوچەشنەکانی بەڵگەیـە لەسەر پاکبوونـەوەو رەوانـدنـەوەی نەخۆشـیو بەسەرچـــوونی غـــەمو پـــەژارەو قەرزدانەوە.
*بەڵگەیـە لەسـەر بـژێوی خـاوەنو فرۆشـگاکەیو شتەوەی لای ئـەودەکریّ یـان هەرکەسێك خزمـەتی بکـاتو خواردنی بۆ دروستبکاتو هاوسەرگیری لەگەڵ ئەنجام بدات.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەر بەهۆی خوولانەوەو گەڕانی.
*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر نەخۆشـیو جەنگ بـەهۆی خراپـیو نادیاریانەوە، چونکە هوێژو عەرەبەکان بەوە گوزارشتی لێدەکەن.
*ئەگـەر ئاشێك بکـڕیّ ژنـدەهێنیّ بەمـەرجیّ دەبەنی بێـت، یـان کـچەکەی دەدات بەشـوو یـان ژن بـۆ کوڕەکـەی دەهێنێت یاخود خزمـەتکارێك دەگریّ یـا سـەفەردەکات ئەگـەر لەوانـەبێت کەسەفەردەکەن.
*ئەگـــەر هـــەژاربوو ســـوودی لێوەردەگریّ چـونکە ئـاش بۆیـەکێك پێویـــستە شـــتیکی هـــەبێت بیـــەویّ بیهاڕێت.
*ئەگەرئاشـی دانـا هـەتا خـەڵکی وورد بکـات لەسـەر ئاوودەریـا فرۆشـگاو دوکانێك دەکاتـەوە ، ئەگـەر فرۆشگاو دوکـــانی نـــەبێتو رزقو رۆزی لێپەیدادەکات، یـاخود بـۆ خـەڵکی رامدەبێت بەیارمـەتی دەسـتەڵاتدارو سوودو قازانجیان پێدەگەیەنیّ.

*بۆئەوەی کاری هارینو وردکردن بەدەستاڕ ئەنجامدەدات هاوسەردەگریٚ یان جووتدەبێت، چونکە ئەو دووبەردە وەك هەردوو هاوسەر وایەو چەقەکەی ئامرازی پیاوەو پارێزگارییە، ئەگەر چەقدارنەبوو جوتبوونەکە حەرامدەبیٚو دەگونجێت دووژنکاری سێکسی لەگەڵ یەکدا بکەن، ئەگەر هیچکام لەوانە نەبوو دەگونجێت هەوڵبدات لەنێوان دووهاوسەر یان دوو شەریکدا یاخود سەفەر بکات لەپێناوی پەیداکردنی بژێویدا.

*ئاشی گەورە ئەگەر لەناوەڕاستی شاردا بینرا یان لەنێو مزگەوتەکانداو ئەو ولاتە ولاتی شەڕبوو شەڕی تیا بەرپادەبێت بەتایبەت ئەگەر ئاگرو بەردی هاڕی.

*هەندێکدەڵێن: ئاش لەسەر ئاو پیاوێکە لەسەر دەستی ئەوداماڵو دارایی زۆر دێت بۆ بەجێهێنانی کاروباری ئەوەی رووی تێدەکات.

*ئەگەر ئاشێکی بینی دەسووڕێتەوە بەئەندازەی هاڕاوەکەی خێری پێدەگات.

*دەگونجێت ئاش ئەگەر بگەڕێو بسووڕێتەوە سەفەربێت، ئەگەر بەبیٚ گەنم سووڕایەوە هیلاکیو ماندبوونە.

*ئەگەر ئاش بەلاریی سووڕایەوە ئەوە خواردن گراندەبێت.

*دەستاڕ دووپیاوی شەریکی دڵڕەقن کەسێکیان بۆ پەیدا نابێت چاکیان بکاتەوە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك ئاشێکی بینی دەگەڕاو دەسووڕایەوە بەبیٚ ئاو ، ئەم خەوەی بۆ راڤەکارێك گێڕایەوە ئەویش وتی: چارەنووسو ئەجەلت نزیکە.

*ئاشی با شەڕو ئاژاوەو نەمانە.

*شکانی ئاش لەلێکدانەوەدا جیاوازی هەیە لەبارەیەوەو هەندێکدەڵێن: قوتاربوونی خاوەنەکەیەتی لەغەمو پەژارە یان بەڵگەیە لەسەر مەرگی خاوەنەکەی.

*ئەگەر بینی ئاشێکی هەیەو کاردەکات خێری دەستگیردەبێت لەرەنجو ماندوبوونی کەسێکیترەوە.

*ئاش بەڵگەیە لەسەر جەنگ بەپێی گوتەی عەرەب کەدەڵێن: ئاشی جەنگ...

(نابلسی) دەڵێت: ئاش لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەرووکردنەوە لەخەوبینەر یان دەوڵەمەندبوون دوای هەژاریو نەداری.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر ژن بۆ کەسێکی رەبەنو خزمەتکار.

*بینینی ئاشێك کەدەسووڕێتەوە بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو سەرکەوتنو ناکۆکی، ئەگەر نانو گۆشتو هەنگوینی هاڕی بەڵگەیە لەسەر خراپی خاوەنەکەیو رووپاماییو بەدبیان.

*ئەگەر گەنمی تیاهاڕی یاخود جۆ یا هەر شتێکی بەسوود بەڵگەیە لەسەر ئاسانکردنی کارو بارەکانیان و رزق و رۆزی و چاکبوونەوەیان لەنەخۆشی و نوێکردنەوەی ئەوەی هەڵدەستێ بەپاراستنی بەرژەوەندیان.
*ئەگەر بینی ئاشێکی هەیە دەسووڕێتەوە بەدۆلاب ئەوە رزق و رۆزییەکی بێشومارە بۆ یەکێك بیبینێ.
*ئەگەر ئاشێکی بینی دەسووڕێتەوە بەبێ هاڕین سەفەرە.
*ئەگەر ئاش بەبێ هۆ سووڕایەوە نزیکبوونەوەی ئەجەل و چارەنووسی خەوبینەرە.
*دەستاڕ هەردوو پیاوی شەریکی خراپ و بەدی یەکدین.
*ئەگەر لەناڕەحەتیدابوو قوتاردەبێ.
*ئەگەر بینی ئاشێکی هەیە خواردن دەهاڕێ بەئاوێکی لەبەر رۆیشتوو یان بەبێ ئاو بژێوی لەماندبوونی کەسێکیترەوەیەو ئەندازەو هێزی ئەو بژێوییە بەئەندازەی هێزی ئاشەکەو سووڕانەوەیەتی لەگەڵ باشی شوێنەکەی.
*ئەگەر بینی بەردی ئاشەکە شکا ئەوە خاوەنی ئاشەکە دەمرێت ، ئەگەر بینی ئاشەکە لەکاردایە ترس و بیم رووی تێدەکات.
*ئاش بەڵگەیە لەسەر ترس و بیم.

*ئەگەر ئاشێك بکڕێ هاوسەردەگرێ ، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ یان کچەکەی دەدات بەشوو یاخود ژن بۆ کوڕەکەی دەهێنێت ، یاخود خزمەتکار بەکرێدەگرێ یان سەفەردەکات ئەگەر سەفەر کاربێت.
*هاڕینی زافەران بەڵگەیە لەسەر خۆشی و شادی و باشی حاڵ و بارو گوتەو نەوازشی باش.
*ئەگەر ئاش بەڵگەبێت لەسەر ژن و پیاو ئەوە بەڵگەیەلەسەر دڵئارامی و ویقار.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشکەوتن بەنەخۆشی زەردوویی.
*ئاشی ئاوو با منداڵی فەرمانڕەوا یان جێگرەکانیەتی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئاسانکردنی کاروبارو کەشتی بەرێکەوتن و بارینی باران.
*دەستاڕ بەڵگەیەلەسەر:
+پشوو.
+دەرووی خێر.
+شەڕوئاژاوەو ژن و کچ.
+رزق و بژێوی.
*ئەگەر هەموو پێداویستیەکانی تەواوبوو بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی کاروبارو سەفەر بەخێرایی.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر ژنی زۆرخۆری شەڕەنگێز کەوا سەرسامە بەخۆی.

**ئاشتبوونەوە (ئاشتەوایی):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئاشتەوایی بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی خێروچاکە بەپێی ئایەتی: ﴿والصلح خير﴾ بانگەشەکردن بۆ ئاشتی بانگەشەیە بۆ چاکیو ڕێنومایی، ڕێگرتن لەئاشتی بەڵگەیە لەسەرنەوەی هاوەڵەکەی ڕێگری خێرە.

* ئاشتبوونەوە بەڵگەیە لەسەر سەلامەتی چونکە یەکێك لەماناکانی ئاشتییە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەیەرەکانییە، ئەگەربینی لەگەڵ نەیارەکەی ئاشتبووەوە ئەوا ناکۆکی لەگەڵ بەرپا دەکات.

* ئەگەربینی دوو پیاو یەکێکیان سەد درهەمی لای ئەوی تریانەو قەرزار قسەیکرد بەرانبەر خاوەنی پارە قەرزار دڵنەرمو بەسۆز دەبێتو خێرو چاکە بەدەست دەهێنێ بەپێی ئایەتی: ﴿والصلح خير﴾(النساء:١٢٨).

* ئەگەربینی پیاوێکی بەناوبانگ یاخود پیاوێکی نەناسیار بانگدەکات بۆ ئاشتەوایی بەبێ قەرزدانەوە ئەوە بانگیدەکات بۆ ڕێنومایی.

* ئەگەر ئاشتەوایی لەسەر کوشتنی کەسێك یاخود خواردنەوەی مەیبوو بەڵگەیە لەسەر خراپیو دڕایەتی نێوان خەڵکی.

* ئەگەربینی نەیارێك بانگدەکات بۆ ئاشتەوایی بەبێئەوەی قەرزەکەی بداتەوە ویڵو سەرگەردانێك بانگدەکات بۆ ڕێنومایی.

* بەستنی ئاشتەوایی لەگەڵ نەیاردا لەسەر نیوەی ماڵ بەدەستهێنانی خێرەو ئاشتبوونەوەی دوو لایەنی ناکۆك لەجەنگدا بەڵگەی دڵنیاییە لەترسو بیمو گەڕانی ڕزقو ڕۆزییە یاخود قورسیو گرانی دەستنیشانکردن یا هاوسەرگیری یا شەریکایەتی یان ڕێککەوتن لەسەر کڕینو فرۆشتن، ئەگەر دوولایەنی جیاواز ڕێککەوتن لەسەر ئاشتەوایی ئەوا بەڵگەی دەرکەوتنو سەرهەڵدانی فتنەو بیدعەیە.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر دڵنیاییو ترسو بیم پشوودانە دوای ماندوبوونو چاکبوونەوەی نەخۆشەو بواردانی ئەجەلو چارەنووسە.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجو ڕزقو ڕۆزیو بژێوی گەڕانو هاوسەرداریو ڕووکردنە بیناسازیو نوێژو کاری چاکە.

**ئاشەوان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: فرۆشەری گەنمو جۆ وەك ئاشەوان وایە پیاوێکە سەرقاڵە بەخۆیو دنیاوە.

ئەگەر پیاوێکی ئاشەوانی بینی ئەوە باپیرەی ئەوپیاوەیە.

*خەوەکەی بەڵگەیە لەسەرئەوەی رزق و رۆزیەکەی لەلای هاورێکەیەوە بۆ دێت.

*ئەگەر لاوێکی بینی ئاشەوانبوو ئەوا رزق و رۆزی بەیارمەتی دوژمنەکەی بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی بوە بەئاشەوان و خواردنەکەی دەهاڕێ بەئەندازەی خۆی خۆی بژێویەکەی بەئەندازەی پێویستی خۆیەتی ، ئەگەر لەسەرو پێداویستی خۆیەوە خواردنی هاڕی بژێویەکەی بەو چەشنەیە.

*ئەگەر بینی بوە بەئاشەوان بژێوی بۆ خۆی و خانەوادەکەی پەیدادەکات.

(نابلسی) دەڵێت: ئاشەوان پیاوێکە خەڵکی هاندەدات لەسەر بژێوی.

*بینینی ئاشەوان بەڵگەیە لەسەر غەم و پەژارەو خەرجی و سوودی ئەوبەرپرسەی کاری قورس وگران لەسەردەستی بەجێدێت.

*بینینی هاڕینی زافەران بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی و بڵاوکردنەوەی نهێنی، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر:

+کاری شادی و خۆشی هێنەر.

+خوێندنی زانیاری و دووبارەکردنەوەی.

*ئەگەر ژنێك بینی زافەران دەهاڕێ ئەوە کاری سێکسی لەگەڵ ژنێکی وەك خۆیدادەکات.

*هاڕینی گەنم بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی غەم و پەژارەو داهاتنی دەروو و هاڕینی تووترکیش بەوچەشنەیە.

**ئاگاداربوون ـ زانین:** (نابلسی) دەڵێت: ئاگاداربوونی مرۆڤ لەخەودا بەڕووداوێکی نهێنی و نادیار بەڵگەیە لەسەر زانستێکی نادیار یان پیشەیەکی بەڕێزو سوودمەند، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئاگاداربوون و شارەزایی لەنهێنیەك لەنهێنیەکانی پەروەردگار کەوا لەگەنجینە یاخود کانزایەکدا خۆی ببینێتەوە.

**ئاگاداریی (وریایی):** (نابلسی)دەڵێت: ئاگاداری لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دووڕوویی و لادان لەحەق و راستی یان لەبیرچوونەوەی قورئان یاخود بەشێك لەقورئان.

**ئاگر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئاگر بەڵگەیە لەسەر دەستەڵات لەگەڵ سوودو زیانی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دۆزەخ و سزای خوایی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گوناهو تاوان و حەرام و ئەوەی دەبێتە هۆی ئەوەی لێی نزیکببێتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رێنومایی و ئیسلام و زانیاری و قورئان لەبەرئەوەی بەهۆیەوە رێنومایی دەکرێت لەتاریکاییداو خوداوەند

لەبارەی (موسی)ەوە دەفەرموێت: ﴿أَوْ أَجِدُ عَلَى النَّارِ هُدًى﴾(طه:١٠)،

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رزق و رۆزی و سوودو قازانجو دەوڵەمەندی چونکە بەهۆیەوە چاکی بژێوی موسافیرو جێنشینی سیاری دەکرێت هەروەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً وَمَتَاعًا لِلْمُقْوِينَ﴾ (الواقعة: ٧٣).

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر جنۆکە چونکە لەئاگر دروستکراون.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شمشێرو فتنە ئەگەر دەنگو ناڵەو دوکەڵی هەبوو.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سزای دەستەڵاتدار چونکە سزای خواییەو دەستەڵاتداری هەردوو دنیایە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشیو ئاوڵەو رشانەوە ، ئەگەر بڵێسەی هەبوو لەگەڵ دوکەڵدا ئەوە فتنەو چەوسانەوە لەو شوێنەدا بڵاودەبێتەوە بەتایبەت ئەگەر لەشوێنی دەوڵەمەندەکانبوو زیانێکە دەستەڵاتدار دەیدات بەسەر خەڵکیدا.

*ئەگەر پشکۆبوو نەخۆشیو ئاوڵەو بەڵاو پەتایە بەتایبەت ئەگەر هەموو خەڵکی گرتەوە.

*ئەگەر ئاگر دابەزییە سەرکێڵگەو شوێنی کشتوکاڵو روەك ئەوە گرەیە روەك دەسوتێنێ یان کوللەیە.

*ئەگەر ئاگرێکی لەرێگەیەکی هاتوچۆدا کردەوە هەتا خەڵکی بەرچاو رۆشن بن زانیاریو رێنومایییە بڵاویدەکاتەوە، ئەگەر شایستەبێت، وەگەرنا دەستەڵاتو هاوەڵایەتیو سوودە خەڵکی وەریدەگرن.

*ئەگەر ئاگرەکە لەسەر رێگەنەبوو یان هەر کەسێك بەلایدا دەرۆیی دەیسووتاند یاخود بڵێسەی بەردەکەوت یان دوکەڵەکەی دەچوو بەسەریا ئەوە بیدعەیەکە دروستیدەکات یاخود دەستەڵاتدارێکی ستەمکارە، بەڵام ئەگەر ئاگرێکی مەزنبوو لەئاگری دنیا نەدەچوو بۆیە داگیرسابوو هەتا زۆرترین دوژمنانی تێفرێ بدات ئەوانیش بیانەوێت زیانی پێبگەیەنن ئەوە زاڵدەبێت بەسەریانداو خۆئەگەر خستیانە نێوی وەك (ئیبراهیم) ـ سەلامی خوای لێبێت ـ قوتاردەبێ، سەرجەم ئەوانەی ئەوکارەیان لەگەڵ ئەنجامدا دوژمنەکانی بوون یاخود ئەوەی کارەکەی لەگەڵ ئەنجامدا پیاو چاکێکبوو.

*ئەگەربینی هەڕەشەی لێدەکات یاخود ئەوانەی ئاگرەکەیان هەڵگیرساند هەڕەشەیان لێکرد بالەخوا بترسێو دەستبەرداری ئەوکارانەبێت کەلەسەریەتی چونکە ئەو خەونە وەك ئاگادارییەك وایە.

*ئەگەر تەنوورو فرنی بینی لەگەڵ ئەو شوێنانەی ئاگری تێدا دەکرێتەوە سوودو قازانجو دەوڵەمەندییە بەدەستی دەهێنێت بەتایبەت ئەگەر بڕێوی لەسەر ئاگربوو.

*ئەگەربینی ئاگرێکە دامرکاوەتەوە یان کوژاوەتەوەو بوە بەخۆڵەمێش یان ئاو کوژاندویەتیەوە هەژاردەکەوێتو لەکاروپیشەکەی دەوەستێ، ئەگەر کەسێك دایگیرساند کەوا بڕێوی لەسەر ئاگرنەبوو بەلام بۆ گەرمکردنەوەی خواردن یان چێشتلێنان دایگیرساند ئەوا ماڵو سامان بەخزمەتکاری دەستەلات دەستدەکەوێ یاخود بەدەستەلاتو یارمەتیان ، وەگەرنا قسەی شەڕوئاژاوەوخراپەیە.

*ئەگەربینی ئاگر بەربوو لەخواردن یان زەیت یاخود لەشتێکی فرۆشراو ئەوە گراندەبێتو دەگونجێت دەستەلاتدار داوای بکاتو خەڵکی ماڵو سامانەکەی ببەن.

*ئەگەر ئاگری خوارد ئەوە ماڵێکی حەرامو ڕزقو ڕۆزییەکی پیسو گەندەڵە، دەگونجێت ماڵی هەتیوبێت هەروەك لەقورئاندا باسکراوە.

*ئەگەر ئاگری لەکوپەیەکدا بینی دەدوێت یان لەمەرکانەیەکدا یاخود لەدەفرێکدا ئەوەی دەدرێتە پاڵ ئەو دەفرە تووشی پەرکەمدەبێ بەهۆی دەست لێوەشانی جنۆکەوە دواتر زوبانی دێتەگۆ.

*هەندێکدەڵێن: ئاگر جەنگە، ئەگەر گڕوبڵێسەو دەنگی هەبێت، ئەگەر ئەو شوێنەی لێی بینرا شوێنی جەنگ نەبوو ڕشانەوەو ئاوڵە یان مردن لەوشوێنە دەکەوێتەوە.

*(ئەبوعەمری نەخعی) بەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ئاگرێکم بینی کەوتەوەو بوو بەڕێگری نێوان منو کوڕەکەم. هەروەها ئاگرەکە پێی دەگوتم: بڵێسە بڵێسە ، چاوساغو کوێر، نانم بدەنێ هەمووتان تیادەبەم ماڵو منداڵو سامانتان دەبەم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: "ئەوە فیتنەو ئاشووبێکە لەکۆتایی دنیادا دەکەوێتەوەو خەڵکی پێشەوای خۆیان دەکوژن پاشان دەمەقاڵە دەکەن بەدوای یەکدا ئنجا پەنجەکانی لەیەك دوورخستەوەو فەرمووی: خراپەکار وادەزانێ چاکیکردوەو خوێنی باوەڕداران لای حەڵاڵتر دەبێ لەخواردنەوەی ئاو.

*ئەگەر ئاگرێکی کردەوە هەتا خۆی پێگەرم بکاتەوە کارێك دەکات هەژاری پێچارەسەربکات، چونکە سەرما هەژارییە.

*لە(ئیبن سیرین)یان پرسی دەربارەی ئەو پیاوەی بەسەری پەنجەیەوە چرایەك ببینێ، ئەویش وتی: ئەوپیاوە کوێر دەبێو هەندێك لەکوڕەکانی دەستی دەگرن.

*ئەگەر ئاگری داگیرساند هەتا گۆشتی پێ ببرژێنێ بابەتێك دەوروژێنێ کەوا غەیبەتی خەڵکی تێدایە. ئەگەر لەگۆشتە برژاوەکەی بەدەستهێنا رزقو رۆزییەکی کەمی بەدەستهێناوە لەگەڵ غەمو پەژارەدا.
*ئەگەر ئاگری داگیرساند هەتا مەنجەڵێکی پێگەرم بکاتو خواردنی پێ لێبنێ کارێك ئەنجام دەدات سوودی بژێوی پەیداکاری تێدایە، ئەگەر لەنێو مەنجەڵەکەدا خواردن نەبوو لەپیاوێك دەوروژێو بەقسە پەلاماری دەداتو ناچاریدەکات لەسەر کارێك.
*ئەو ئاگرەی دەکەوێتەوەو لەشو لارو جلوبەرگ دەسووتێنێ زیانو بەلاو نەهامەتییە رووی تێدەکات.
*ئەگەر پزیسکێ ئاگری وەرگرت ماڵو سامانێکی حەرام لەدەستەڵاتدارەوە بەدەست دەهێنێ ، ئەگەر بڵسەی ئاگر لێیدا خەڵکی باسو غەیبەتیانکردوە.
*داخکردن بەئاگر برینداركردنەوە بەگوفتاری خراپ، بڵێسە قسەو وشەی خراپە، ئەگەر بڵێسەپەڕی بەسەریا گوێبیستی قسەو گوفتارێکدەبێ کەوا رقی لێدەبێتەوە.
*ئەگەر مەشخەڵێك ئاگری بەدەستی خۆیەوە بینی بوارێکی فراوانی لەلایەن دەستەلاتدارەوە دەستگیردەبێت. ئەگەر لەنێو خەڵکیدا دایگیرساند دژایەتیو ئاژاوە دەخاتەوە لەنێوانیانداو تووشی خراپەیاندەکات.
*ئەگەر بازرگانێك ئاگری بینی لەبازاڕو فرۆشگاکەی دەکەوێتەوە ئەوە دووڕوویی‌و بازرگانیەتی، وەگەرنا ئەوەی بەدەستی دەهێنێت حەرامە.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا مژدەو ئاگاداریو جەنگو سزاو دەستەلاتو زیندانیو زەرەرو گوناهو فەڕوپیتە.
*ئەگەر ئاگرێکی بینی گڕوبڵێسەی هەبوو داری دەسووتاندو گڤەو ناڵەی هەبوو فتنەیە زانای تێدا لەناودەچێ بەئەندازەی ئاگرەکە.
*ئەگەر ئاگرێکی لەدڵی خۆیدا بینی ئەوە خۆشەویستیەکی زاڵە بۆیەکێك لەخۆشەویستەکەی دوورکەوتبێتەوە.
*ئەگەر دووئاگری بینیو هەریەکێکیان رووبەویتر دەچوو دوو سەربازی دژ بەیەکنو، کامیان داری زۆرتربێ ئەوا هێزو توانای زیاترە ئەوەشی رەشەباکەی لەگەڵدابێ سەرکەوتن بۆ ئەوەیانە. ئەوەشی رەشو تاریکتربێ کەسوکارو خانەوادەکەی مەبەستیان پتر پیسو گەندەڵە، خۆ ئەگەر لەرەنگا وەك یەك وابوونو هیچیان نەسووتاند ئەوە دوو فتنەن لەشوێنێکدا دەکەونەوەو ئەوەیان کەئاو لێوەی نزیکترە پتر درە ، ئەوەی ئاوی دەکرێ بەسەرا تیادەچێت ، بەهەمان شێوە ئەگەر بارانباری بەسەر هەر یەکێکیاندتا هەر بەوچەشنەیە.

*هەرکات ئاگرەکە دوکەڵی لەگەڵدابێت ئەوا سزاو زەرەری زیاترە.

*ئەگەر ئاگرێکی لەشەوێکی تاریکدا هەڵگیرساند هەتا خەڵکی ڕێ بەدەربکەن زانیاری بەدەستدەهێنیٚو ڕێنموویی خەڵکی پێدەکات، ئەگەر لەسەرەڕێ ئاگری کردەوەو بەبێ بوونی تاریکایی بیدعەو لەخشتەبردنە.

*هەروەها دەڵێن: ئاگر لەڕۆژدا بەڵگەی جەنگو فتنەیەو لەشەویشدا بەڵگەی تەبایی‌و خۆشییە.

*ئەگەربینی ئاگر دەپەرستێ حەز لەجەنگ دەکاتو دەگونجێت گوێڕایەڵی شەیتان بکات لەسەرپێچیدا.

*ئەگەربینی فەرمانی پێکرا ڕوو بەدۆزەخ بەند دەکرێ.

*ئەگەر چوە نێو ئاگرو هاتە دەرەوە دەچێتە بەهەشت.

*ئەگەربینی ئاگری فرۆشت یان بەهەشتی کڕی حەمامێك دەفرۆشێ، دەگونجێت ئەوە بگەڕێتەوە بۆ کرداری دونیایی لەخێرو شەڕ.

*ئەگەر کەسێکی بینی چوە نێو ئاگرو سزا درا ماڵو سامان زەرە دەکات یاخود گوناهێك ئەنجامدەدات شایستەی ئاگری دۆزەخ دەبێت.

*ئەگەر بەئاشکرا دۆزەخی بینی با ئاگاداری دەستەلاتداربێ.

*ئەگەر چوە نێو ئاگرو سزای چێژت فیتنەو ئاشوب دەکەوێتەوە.

*ئەگەر ئاگرێکی هەڵگیرساوی بینیو لەپاڵیا کۆمەڵێك هەبوون فەڕو بەرەکەت بەدەستدەهێنن.

*ئەگەر ئاگرێکی بینی پێی خۆشبوو سروەیەکی خۆشی ڕووی تێدەکات.

*ئەگەر ئاگری تێبەربوو بەلاٚم نەیسوتاند بەڵێنەکەی بەسەر دەبات.

*ئەگەربینی ئاگر بەشێك دانەوێڵەی سووتاند نرخەکەی بەرزدەبێتەوە.

*ئەگەر ئاگری بینی لەژێر مەنجەڵێکدا هیچ خواردنێکی تێدانەبوو بژێوی پەیداکاری ماڵی لەسەر شتێك تورەدەبێ کەوا سوودی پێناگەیەنێت جگە لەزیان.

*ئاگری سووتێنەر نسکۆو شکستە لەلایەن دەستەلاتدارەوە.

*ئەگەر فەرمانڕەوایەکی بینی ئاگری کردەوە بەلاٚم دەکوژایەوە لادەبرێ.

*ئەگەر مەشخەڵەئاگرێکی بینی لەبەر دەرگاکەی بەبێ دوکەڵ بەڵگەیە لەسەر (حەج).

*ئاگر بەربوون لەپەنجەکان بەڵگەیە لەسەر ستەمی نووسەران.

*ئاگر بەربوون لەدەست ستەمو زۆرداریە .

*ئاگربەربوون غەمو پەژارەیە.

*ئەگەربینی ئاگر لەئاسمان دابەزی خراپەیەو ئەگەر بەرنەبوو لەهیچ شتێك بەربەرەکانیەکی توندوتیژە بەزوبان بەبێ زیان.

*ئەگـەربینی لەشـوێنێکەوە روو بەئاسمان دەچوو خەڵکی ئەو شوێنە بەسەرپێچی دەجەنگن لەدژی خوداو بوختانێکی گەورە هەڵدەبەستن.
*ئاگری بەسوودو تیشكو رووناکیدار دڵنیاییە بۆیەکێك بترسێ و نزیکبوونەوەیە لەدەستەڵاتدار.
*ئەگەربینی ئاگرێکی لەبەردەرکی دەستەڵاتداردا کردەوە مولـك و دەسـتەڵاتێکی مـەزن و هێز بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەربینی تیشكو رووناکی ئاگرەکەی لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوای رووناککردەوە زانیارییەکە لەرۆژهەڵات و رۆژئاوادا باسدەکرێ.
*ئەگەربینی ئاگر لەماڵەکەیدا کەوتەوە فەرپیت بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەربینی ئاگرێك تیشكو رووناکی لەسەریەوە بلاوکردەوە یاخود لەماڵەکەی هاتە دەرەوەو تیشكو رووناکی هەبوو ژنەکەشی دووگیانبوو کوڕێکی دەبێت کاروباری بۆ دەبات بەڕێوەو ناوبانگێکی مەزن دەردەکات یاخود خۆشحاڵی لەژنەکەیەوە دەبینێ.
*ئەگەربینی ئاگرێك لەسەر لوتکەی چیایەك دەکاتەوە نزیکدەبێتەوە لەخوداوەند یاخود سەرجەم پێداویستیەکانی بەجێدێت ، ئەگەر ئاوارەبوو دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی بەسەلامەتی .

*ئەگەر ئاگر لەماڵەکەیدا کەوتەوە ماڵەکەی وێراندەبێت.
*ئەگەر ئاگرێکی لەتەنورەکەیدا بەدیکردو هاوسەرداربوو ژنەکەی دووگیاندەبێت.
*ئەگەربینی لەنێو ئاگرا دانیشتوەو نایسوتێنێ دەستەڵاتدار لەخۆی نزیکیدەکاتەوەو نهێنی خۆی پێدەسپێرێ و زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا ، ئەگەر کاروبارێکی تێکەڵبوو رێنومایی دەکرێ.
*ئاگر لەبیاباندا جەنگێکە روونادات، ئەگەر پشکۆیەکی لەنێوجەرگەی ئاگر هەڵگرت ماڵێکی حەرام لەلایەن دەستەڵاتدارەوە بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەربینی ئاگرێك لەئاسمانەوە دابەزی و سووتاندی بەڵام کاری لێنەکرد سەرباز لەماڵەکەی دادەبەزن.
*ئەگەر ئاگری بەردا لەخەڵکی ئاژاوەو دژایەتی دەخاتەوە لەنێوانیاندا.
*ئەگەر ئاگرێك لەسەریەوە دروستبوو نەخۆشیەکی سەختو گران دەگرێ لەگەڵ تادا.
*ئەگەر لەنێوقەدی خۆیدا ئاگری بەدیکرد بەڵام گەرماو تینی نەبوو راستگۆیی و دڵنیایی و دەستەڵاتو زاڵبوون بەسەر دوژمنەکانی بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر ئاگرێکی بینی کوژایەوە فیتنەو ئاشوب دادەمرکێتەوە لەو شوێنەدا کەئاگرەکەی تێدا کوژاوەتەوە.

* ئەگەر ئاگرێکی بینی دادەگیرسێ لەماڵەکەیداو خانەوادەکەی رووناکی لێوەردەگرن و پاشان بینی کوژایەوە بژێوی پەیداکاری ئەو ماڵە دەمرێ، ئەگەر ئاگرەکە لەولاتێکدابوو مەرگی سەرۆکی ئەو ولاتە یان بالاترین زانایەتی ، ئەگەر لەکێڵگەو بێستانەکەیدا بوو مەرگی خۆی یان منداڵەکانیەتی، ئەگەر لەماڵەکەی خۆیدا کوژایەوە پاشان رەشەبایەك چوو بەنێویداو دیسان هەڵیگیرساندەوە دز دەچێتە نێو ماڵەکەی.
* ئەگەر ئاگری خستەنێو دەفرێ یاخود بۆ خۆی برد ماڵ و دارایی حەرام بەدەستدەهێنێ.
* ئەگەربینی ئاگر لەکوپە یان مەرکانەو سەرجەم دەفرێکدا دەردێ لەلێکدانەوەدا دەدرێتە پاڵ ئەو دەفرەو زەبزەبەو شێتگیرییەکی جنۆکە لێیدەدات و لەسەرزاری ئەو دێتەگۆ.
* ئەگەر ئاگر زیانبەخشبوو بەڵگەیە لەسەر دەستەڵاتداری ستەمکار، ئەگەر خەڵکی سوودیان لێوەرگرت بەڵگەیە لەسەر دەستەڵاتداری دادپەروەر.
* ئەگەر پشکۆیەکی هەڵگرت لێی ونبوو هەڵناسێت بەبەرژەوەندی خۆی یان کەسانیتر.
* ئاگر لەزستاندا بەڵگەیە لەسەر میوەو خواردنی ئاگریش بەڵگەیە لەسەرخواردن و خواردنەوە لەدەفرو قاپی حەرامدا وەك زێرو زیوو.

دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەژاری و سواڵکردن.
* دەگونجێت بڵێسەو کڵپەی ئاگر لەبێداریدا بەڵگەبێت لەسەر تین و گەرمی دڵ یاخود مردن.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی گرتن بەتا یاخود ئاگرپەرست.

**ئاگرپەرست:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا پیرێکی ئاگرپەرستی بینی دوژمنەکەی نایەوێت نەیارەکەی تیاببات.
* ئەگەربینی بوە بەئاگرپەرست واز لەئیسلام دەهێنێ و گوناهە گەورەکان ئەنجامدەدات و خوداوەند خەشم وقینی لێدەگرێ.
* ئەگەربینی دەستی بوە بەدەستی (کیسرا) لەسەردەستی ئەودا رووداوەگەورەکان روودەدات ، پاشان دەمرێ بەبێباوەڕی ، مەگەر خوداوەند خێرداری بکات ، ئەگەر بینی دەستی وەك خۆی لێهاتوەتەوە تەوبە دەکات.
* ئەگەر ئاگرپەرستێ بینی بوە بەجوولەکە یان مەسیحی لەحاڵێکەوە دەچێت بۆ حاڵێکیتر کەوا لەحاڵ و باری پێشوو باشترە.
* ئەگەربینی بوە بەئاگرپەرست هەوڵدەدات لەدنیادا چونکە ئاگرپەرستان دنیاپەرستن.
* ئەگەربینی ئاگر دەپەرستێ تووشی فتنە دەبێت لەگەڵ دەستەڵاتداردا،

ئەگەر ئاگرەکە دامرکابووەوە بەدوای ماڵوسامانی حەرامدا دەچێت.
*ئەگەر بینی ئاگرپەرستە ئەو ئاینەی دەریدەخات خوداوەند پێی رازی نییە لەپێناوی بەرژەوەندی دنیادایە.
**ئاگردان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مێردی ژنە کەوا ماندو دەبێتو کاروباری ماڵ دەگرێتە ئەستۆی خۆیو سەری کزدەکاتو کاروبارەکانی دەبات بەڕێوە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەر بۆ رەبەن.
**ئاگرکردنەوە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئاگرکردنەوە گەڕانە بەدوای کارێکدا هەتا رووندەبێتەوە.
*ئەگەر بینی ئاگردانێکی گەرمکرد هەتا خۆی پێگەرمبکاتەوە پەنای بەپیاوێکی دڵرەقی دەستەلاتدار گرتوە، یان پەنای بەپیاوێکی دەستەلاتدارگرتوە بۆ قوتاربوون لەهەژاریو سوود وەرگرتن لەوپیاوە.
*ئەگەر ژنێك بینی ئاگر دەکاتەوەو بەفوولێکردن گەشایەوە کوڕێکیدەبێت.
*ئەگەر بینی بەردێکی کێشا بەبەردێکیترداو ئاگریان لێکەوتەوە دووپیاوی دڵرەق دەگەن بەیەکو کوشتارێکی توند لەنێوانیاندا بەرپادەبێو ئاگر لەو جەنگو شەڕەدا تیایاندەبات چونکە بڵێسە کوشتارە بەشمشێر.

*هەندێکدەڵێن: بەردنەستێ بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری رەبەن، ئەگەر ئاگرەکە بەرزبووەوە هاوسەرەکەی دووگیاندەبێ کوڕی دەبێ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شەڕی نێوانیان یان شەڕ لەنێوان دوو نەیارو دووشەریك ، بڵێسەش قسەو وتەی نێوانیانە، ئەگەر جلوبەرگ یان لەشو لاری سووتاند شەڕە روودەکاتە ماڵو ئابڕوو لەشولاری، ئەگەر قورئانی سووتاند یان چاوی ئەوە برینداریيە.
**ئاگرکەرەوە:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر رێنومایيدەرێك رێگە نیشاندەدات.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر :
+خێرو چاکەو زانیاری.
+یەکێك کەوا خەڵکی دەگەڕێتەوە بۆ گوتەو کرداری لەگەڵ سستی بیرو کەمی پشكو بەشی.
**ئاگر هەڵگیرسێنەر:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەی خێرو بەدەستهێنانی پێداویستییەو نزیکبوونەوەیە لەگەورە پیاوان.
*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر زانیاری مەگەر جلوبەرگی بەئاگر بسووتێنرێ ، ئەوجا بینینی بەڵگەیە لەسەر شەڕو فتنەو رۆچوون لەماڵو ساماندا.
**ئالا:** (نابلسی) دەڵێت: لەئایندا فەرمانوحاڵێکی ئاشکراو دیارە.

*ئالآو بەیداخ زانا یا پێشەوا یان دنیا نەویستێکی ئازایە یاخود دەوڵەمەندێکی دەستو دڵچاکە یا بەهێزێکی زاڵەو پابەند دەبێت پێوەی.
*ئەگەر ئالآو بەیداخەکە سووربوو لەو پیاوەی باسکراوە خۆشیو شادی بەدیدەکرێ.
*ئالآو بەیداخ بۆ ژن مێردە.
*ئەگەر چەن ئالآو بەیداخێك ببینێ ئەوە بارانە، ئەگەر رەشبوو لێوەی جیهان دەبینێ، ئەگەر سپیبوو پیاوێکی غیرەتکارەو ژن ناهێنێت.
*ئەگە ئالآکە سووربوو جەنگە.
*ئەگەر زەردبوو دەردو نەخۆشی دەکەوێتە نێو هۆردوی سەربازانەوە.
*ئەگەر سەوزبوو سەفەرێکە لەخێرو چاکەدا.
*ئەگەر ئالآو بەیداخێك لەخەودا ببینێ کاروبارەکانی تێکەڵدەبن بەسەریەکداو ناتوانێت رێنمونی وەربگرێ.
*ئەگەر ئالآوبەیداخی بینی رێنموونی دەکرێ بۆ کردارەکانیو لەغەمو پەژارەی قوتار دەبێتو دەروازەی داخراوی بۆ ئاوەلا دەکرێو سینەی فراوانو گوشاد دەبێت.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر لەخەودا ئالآو بەیداخێك ببینی لەوشارەدا ناودەبرێ.
*ئەگەر ژنێك بینی سێ ئالآی ئەسپەردەکرد سێ شوودەکات بەکەسانێکی رێزدارو شکۆمەندو دەمرن بەدووی یەکدا.

*ئالآ لەخەودا هاوسەرگیرییە.
*بۆکەسێکی دووگیان کورە.
*ئالآیەکی گەورە رەشەباو بارانە.
*خاوەنی بەیداخو ئالآ بەدادوەر راڤەدەکرێ ، ئەگەر هەڵیگرتو ئەوکەسەش خوازیاری دادوەریبوو ئەوە بەدەستی دەهێنێت.
**ئالآگر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئاگر دادوەرە، چونکە تەماشا دەکرێ.
**ئالآو بەیداخی سەربازان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئالآ خواناس یاخود شاسوارێکە خەڵکی وابەستەن پێوەی بەپێی ئایەتی: ﴿وَعَلامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾ (النحل: ١٦).
*ئالآی سوور بەڵگەیە لەسەرکەوتنەوەی نەخۆشی لەنێو سەربازگەداو سەوزیش بەڵگەیە لەسەر سەفەر لەخێرداو هی سپی بەڵگەیە لەسەر بارانو رەشیش بەڵگەیە لەسەر نەبوونیو قاتیو قڕی.
*ئەگەر ئالآیەکی بینی ئەوە لەولآتەکەی باسدەکرێ، ئەگەر سەرسامێك ئالآیەکی لەخەودا بینی بەڵگەیە لەسەر رێنومایی بەپێی ئایەتی: ﴿وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِلسَّاعَةِ فَلا تَمْتَرُنَّ بِهَا﴾ (الزخرف: ٦١).
*ئالآ بۆ ژن هاوسەرە، ئەو ئالآیەی دەدرێتە پاڵ زانایەکی خواناس ئەگەر سووربوو دەروو و خۆشحاڵییە، ئەگەر رەشبوو پلەوپایەی پێدەدرێ.

*هەروەها دەڵێن: ئاڵای رەش بەڵگەیە لەسەر بارانی بەردەوامو سپیش بەڵگەیە لەسەر تاوە بارانێكو سووریش جەنگە.

*ژنێك لەخەودا بینی سێ ئاڵای ئەسپەردەكرد، هات بۆلای (ئیبن سیرین)و ئەم خەوەی بۆ گێرایەوە ئەویش وتی: ئەگەر خەوەكەت وابێ سێ شوو دەكەیت بەسێ پیاوی پایەدارو رێزدارو هەرسێكیان دەكوژرێن. لێكدانەوەی خەوەكەش بەو چەشنەبوو.

**ئاڵتوون:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زانستێكی بەسوودو هاورێیەكی راستگۆو هاوسەرێكی گوێرایەڵو كورێكی ساڵح، زیوی پوختەش هەروەهایە.

**ئاڵتوونچی( زەرەنگەر ):** (نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر خۆشیو شادی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی حەقو راستی لەگەڵ یەكدا تێكەڵدەكات.

**ئاڵۆش( خوروو ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئاڵۆشو خورووی لەشو لار لەدەستدانی رایەڵەی خزمایەتییەو ئارامگرتنە لەسەر بەدیو خراپییان.

(نابلسی)دەڵێت: ئاڵۆشو خوروو هەژارییەو بەجێهێنانی داواكارییەكانی ماڵو منداڵە.

*ئەگەر لەگەڵ ئاڵۆشو خوراندا خوێنو كێم هەبوو ماندوویەتیو هەژاری دەخایەنێتو بەردەوام داواخوازی دەبن.

*ئەگەر لەشو لاریی خوراو هەر دانەمركایەوە كمارو بارێك رووی تێدەكات ئارام ناگرێت لەسەریو بێئاگا دەبێت لێی.

*ئەگەر خوروەكەی نیشتەوە خێرو چاكەی بەماندوبوون دەستدەكەوێتو لەغەمو پەژارە قوتاردەبێت.

*ئەگەر خوروخورو ئاڵۆشی لەرێكەوبان لەنێو خەڵكیدا بەدیكرد ئەوە غەمو پەژارە دێت بەسەریا لەگەڵ بەدەستهێنانی ماڵو داراییوناوبانگ دەركردن.

**ئامارژەكار بەچاوو برۆ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێكی خەشمو قینداره، ئەگەر پیاوێكی ئاوای بینی ئەوە بەكاروبارێك دڵخۆشدەبێ لەسەرەتاكەیداو لەكاتی دوایی و كۆتاییشدا غەمو پەژارە دایدەگرێ.

**ئامرازی ئاسنگەر:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی ئامرازی ئاسنگەری لەداروتەختەیە لەپلەوپایەی كەمدەبێتەوەو موڵكو دەستەلاتی بەسەر دەچێ.

*ئەگەر بوو بەخاوەنی ئامرازی ئاسنگەری ئەوە دەستەلاتو پلەوپایە

بەدەستدەهێنێ ئەگەر شایستەبێ، وەگەرنا خێروسوودی دەستگیر دەبێ.
*ئەگەر ئامرازی ئاسنگەر ئاگری تێدابوو بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی پێداویستی رزق‌و رۆزی، ئەگەر ئاگری تیانەبوو بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارە.
*ئامرازی ئاسنگەر ئەگەر لەزێرو زیوبوو بەڵگەیە لەسەر دڵسۆزی لەیەکتاپەرستی‌و یەکلابوونەوە بۆ بەندایەتی.
*ئامرازی ئاسنگەر ئەگەر لەشووشەبوو بەڵگەیە لەسەر پلان‌و فرۆفێڵ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنێك زوو زوو دووگیانبێت بەڵام زوو لەباری بچێت، یاخود پیاوێك زوو بەخێرایی هەستی بجووڵێ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیندان‌و شوێنی سزای پۆلیس‌و گرتووخانە.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئاسانکردنی کاروبار ئەگەر لەئاسنبوو.
**ئامرازی گواستنەوە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە بەماندوبوون‌و هیلاکی ماڵ‌و سامان بەدەستدەهێنێ. هیچ خێرێکی تێدا نییە ئەگەر روو لەنەخۆشبکات چونکە بەڵگەیە لەسەر مردن‌و گواستنەوەی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لانەیەکی گشتی کەوا خەڵکێکی تیا کۆدەبێتەوە پاشان دەڕۆن‌و خەڵکیتر رووی تێدەکەن.

**ئامرازی گواستنەوەی دەریایی:** (نابلسی)دەڵێت: کەشتی راو لەخەودا رزق‌و رۆزییە لەگەڵ سوودو قازانج.
*ئەگەر لەخەودا بینی سواری کەشتییەکی سەیرو نامۆ بوەو پاشان بوو بەخاوەنی‌و مێردی ژنێك لەو خاکو زەوییە دەهێنێ کەوا کەشتییەکە دەدرێتە پاڵی یاخود کیژێکی شۆخ‌و شەنگ دەهێنێ یاخود سەردەکەوێت بەسەر دوژمنەکانیدا یا روو لەناوچەیەکدەکات، یاخود دەبێت بەخاوەنی کاڵاوشتومەك.
*کەشتی تیژتێپەڕ دەگونجێت فرمان‌و سۆزو میهری خوایی بێت بۆ یەکێك سواری ببێت.
*بەلەم خزم‌وکەس‌وکاری خەوبینەرە لەگەڵ ئەوەی لەئاسماندا دەبینرێ لەئاڵۆزی‌و گۆڕانی حاڵ‌وبار بەهەمان شێوە دەگەڕێتەوە بۆ بەلەمەکە بەتایبەت ئەگەر خەوبینەر لەدەریادابوو.
**ئامۆژگاری:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ناپاکی‌و لەخۆ باییبوونە لەدوژمنەوە بەپێی ئایەتی: ﴿وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ ، فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ﴾ (الأعراف: ٢١ ـ ٢٢).
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر پەیوەندی نێوان ئامۆژگاریدەرو ئامۆژگاریکار، ئەگەر شەڕو ئاژاوە لەنێوانیاندا هەبوو ئاشتدەبنەوە یاخود هەر یەکێکیان لەشارێکدابوون کۆدەبنەوە.

**ئامۆژگاریدەر:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر: گریانو غەمو پەژارەی بەردەوام.
*ئەگەر ئامۆژگاریدەر چووەلای نەخۆشێك دەمرێ.
*ئامۆژگاریدەر بەڵگەیە لەسەرئەوەی مرۆڤ پەندو ئامۆژگاری لێوەردەگرێ لەقورئانو سوننەتو زانایەکی ریش سپی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی پەندی لێوەردەگیرێ وەك بەلاداران.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی ئامۆژگاریدەکات بەڵگەیە لەسەر:
+ئەوەی دەیڵێ.
+کاروبار پێسپاردن.
+شکۆمەندی.
+زۆری زانیاری.
+چل ساڵو بەسەرچوونی تەمەنی.
+کەرامەت پێسپاردنی لەلایەن خوداوە.
**ئاو:** (نابلسی) دەڵێت: ئاوی دەریا لەلێکدانەوەدا دەستەلاتێکی بەهێزی تۆقێنەرە ، هەروەك چۆن دەریا مەزنو بەسامە.
*ئاو بەڵگەیە لەسەر ئیسلامو زانیاریو ژیانو فەرپیتو خۆشحاڵی چونکە ژیانی پێدروستدەبێ هەروەك خوداوەند دەفەرموێ: ﴿لأسقيناهم ماءً غدقًا ، لنفتنهم فيه﴾(الجن: ١٦ـ ١٧).
*دەگونجێت ئاو بەڵگەبێت لەسەر نوتفە، چونکە خوداوەند بەئاو ناوزەدیکردووە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر ماڵو سامان چونکە بەهۆیەوە پەیدادەبێ.
*ئەگەر ئاوێکی سازگاری لەبیرێك خواردەوە یان دای بەیەکێك ئەگەر نەخۆشبوو ئەوا چاکدەبێتەوە لەنەخۆشییەکەیو ژیانی بەردەوامدەبێو مەرگی زوو نایەتە دی، ئەگەر نەخۆشنەبوو بێهاوسەربوو ژن دەهێنێ.
*ئەگەر ژنی لەنەتەوەیەکدا مارەبڕیبوو کۆدەبێتەوە لەگەڵیو چێژی لێوەدەگرێ.
*ئەگەر هیچکام لەوانە نەبێت ئەوا موسوڵمان دەبێت، ئەگەر بێباوەڕبێ زانیاری بەدەستدەهێنێ ، وەگەرنا ماڵێکی حەلاڵی دەستگیردەبێ ئەگەر بازرگان بێت ئەگەر شتێك تێکەڵ بەئاوەکەبوو خراپیکرد بەڵگەیە لەسەر حەرامو خراپ وەك ئەوەی لەماڵو کۆمەلانی خەڵکی ناموسوڵماندا بیخواتەوەو، زانیارییەکی خراپو جووتبوونە بەحەرام یان ماڵی گەندەڵو پیسە.
*ئەگەر ئاوە لێڵەکە تاڵو گەنیوبوو نەخۆشدەکەویو کاروکاسبی خراپ دەبێ یان بڕێوی دەگەڕێ یاخود مەزهەبی دەشێوێ، هەر مرۆڤێك بەئەندازەی خۆیو بەو شێوەیەی کەشیاوو گونجاوە لەگەڵی یان ئەو شوێنەی تێدا ئاوەکەی خواردوەتەوەو دەفری ئاو هەڵگر.

*ئەگەر ئاوی لەدەفرێکدا هەڵگرت ئەگەر هەژاربوو سوودو قازانجدەکات، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەرە دەگرێ ، ئەگەر هاوسەرداربوو ژنەکەی دووگیاندەبێ یان کچەکەی.

*لەبەرۆیشتنی ئاو لەماڵانو چوونە نێو کۆلانەکان هیچ خێرێکی تێدا نییە، ئەگەر بۆ سەرجەم خەڵکیبوو ئەوا فتنەو ئاشوبو زەرەرو تالانیو نەخۆشیو کۆکەرەشەیە ، ئەگەر لەلایەکی تایبەتدابوو تەماشای حاڵوباریدەکرێ، ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێو خەڵکی بەگریان شیوەن دەچنە نێوی، بەهەمان چەشنە ئەگەر لەوماڵەدا ئاوو ئاوەرۆی زێراب تەقی یاخود کانی هەڵقولا چاوی فرمێسك رێژی ببەهۆی گریانی بۆ نەخۆش یان لەکاتی خواحافیزی لەموسافیردا فرمێسکدەرێژێ.

*هەروەها ئاو لەبەر رۆیشتن لەکۆلانێك یاخود پەنگبەستنی بەهەمان شێوازە.

*رۆینی ئاو لەشوێنو جێگەی روەك فەرویتەو، زاڵبوونیشی بەسەر ماڵۆلانەدا بەلاو نەهامەتییە لەلایەن پەروەردگارەوە دێت بەسەر خەڵکی ئەو ناوچەیەدا لەکوشتنو برین یان کۆکەرەشەو خنکاندنو خاپووربوونی ماڵانە.

*ئەگەربینی ئاوی لەپەرداخێکدا پێدرا بەڵگەیە لەسەر کوڕ. ئەگەر ئاوێکی سازگاری لەجامێکدا پێدرا بەڵگەیە لەسەر کوڕ ، ئەگەر ئاوێکی سازگاری خواردەوە لەپەرداخێکدا خێری لەلایەن کوڕو هاوسەرەکەیەوە دەستگیر دەبێ چونکە شووشە گەوهەرو ناوەرۆکی ژنانەو ئاویش منداڵو کوڕپەلەیە.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەربینی ئاوێکی گەرمدەخواتەوە غەمو پەژارە رووی تێدەکات.

*ئەگەربینی خرایە نێو ئاوێکی سازگار نهێنیەکی کتوپڕە، هەروەها گوتراوە: ئاو بۆچاکەکاران خێرو نازو نیعمەتە بەپێی ئایەتی: ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾(الرحمن:٤٠).بۆ خەڵکی دیکەش بەلاو نەهامەتییە.

*هاتنەدەرەوەی ئاو لەدیوار غەمو پەژارەیە لەلایەن پیاوانەوە وەك براو زاواو هاورێ.

*ئەگەر بینی ئاوەکە هەڵقولاو لەماڵەکە هاتە دەرەوە لەسەرجەم غەمو پەژارە قوتاردەبێ ، بەلام ئەگەر ئاو لەماڵەکە نەهاتەدەرەوە غەمو پەژارەی هەمیشەییە، ئەگەر ئاوەکەسازگاربوو غەمو پەژارەیە لەلەشساغیدا ، ئەمەش ئەگەر ئەو ئاوە لەبەری نەرۆیی ئەگەر لەبەری رۆیی خێرێکی بەردەوامە بۆ خاوەنەکەی گەر زیندوویێ یاخود مردوو هەتا رۆژی قیامەت.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر بینی لەماڵەکەیدا سەرچاوە ئاوێکی لەبەرۆیشتووی تێدایە ئەوا کچێك دەهێنێ.

*ئەگەربینی چەند سەرچاوەیەك هەڵقوڵا ئەوا ماڵو سامان لەسەرزەنشتدا بەدەستدەهێنیّ.
*ئاوی سازگار هەرزانی نرخەکانەو بڵاوبوونەوەی دادپەروەرییە.
*ئەگەر بینی ئاوێکی زۆری خواردەوە لەرادەی خۆی زیاتر لەکاتی بێداریدا تەمەنی درێژدەبیّ.
*هەروەها گوتراوە: ئاوخواردنەوە پارێزراوییە لەدوژمنو هێنانوبردنی لەدەمیدا چارەسەری ناڕەحەتیی بژێوییە، بەراخستنی دەست لەئاودا هەڵسوڕانی ماڵوسامانە.
*ئاوی راوەستاو لەئاوی لەبەرۆیشتوو لاوازترە لەهەموو حاڵێکدا.
*هەروەها دەڵێن: ئاوی راوەستاو زیندانییە، ئەگەر بینی کەوتە نێو ئاوێکی راوەستاوەوە دەکەوێتە زیندانو غەمو پەژارە دەیگریّ.
*ئاوی سوێریش غەمو پەژارەیە، ئاوی رەش ئەگەر لەبیر دەرهێنرا ژنێکە دەیهێنیّو هیچ خێرێکی تێدانییە.
*هەروەها دەڵێن: بینینی ئاوی رەش تێکچوونو وێرانی لانەو ماڵەو خواردنەوەشی لەکیسدانی بینایی چاوە.
*ئاوی تامو بۆنگۆڕاویش ژینێکی پڕ غەمو پەژارەیە.

*ئاوی بۆگەن ماڵی حەرامەو ئاوی زەرد نەخۆشییەو، چوونی ئاویش بەناخی زەویدا لابردنو ملکەچیو رەواندنەوەی نازو نیعمەتە بەپێی ئایەتی: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَاؤُكُمْ غَوْرًا فَمَنْ يَأْتِيكُمْ بِمَاءٍ مَعِينٍ﴾(الملك : ٣٠).
*ئاوی زۆر گەرم ئەگەر بەشەو یان رۆژ بەکاریهێنا ناڕەحەتی رووی تێدەکات لەلایەن دەستەڵاتدارەوە.
*ئەگەر بینی بەشەو بەکاریهێنا ترسوبیم لەغەیبەوە رووی تێدەکات.
*ئاوی لێڵ ناڕەحەتیو ماندبوونەو خواردنەوەی نەخۆشییە.
*کەفی سەرئاو ماڵو سامانێکە کەواهیچ خێرێکی تێدا نییە.
*ئەگەر لەئاوی دەریای خواردەوەو لێڵبوو غەمو پەژارە لەلایەن بەرپرسو فەرمانڕەواوە رووی تێدەکات.
*ئەگەر بینی تەماشای ئاوێکی سازگار دەکاتو رووی خۆی تێدا بەدیدەکات هەروەك چۆن لەئاوێنەدا دەیبینیّ ئەوا خێرێکی گەورەی دەستگیردەبیّ، ئەگەر رووی خۆی بەجوانی تێدا بەدیکرد ئەوا چاکە لەگەڵ خانەوادەکەی ئەنجامدەدات.
*رۆکردنی ئاو خەرجکردنی ئاوە بەدەر لەپێداویستی خۆیو بەڵگەی ئاتاجی بوونە.
*دەستنوێژگرتن بەئاوی سازگار یا لێڵ یاخود سارد یان گەرم باشە.

*ڕۆیشتن بەسەر ئاودا لەخۆبایبوونەو ئەنجامدانی کارێکی مەترسیدارە ، ئەگەر لێی هاتە دەرەوە ئەوا پێداویستی خۆی بەجێدەهێنێ.

*هەموو دەریاو ڕووبارێك یاخود دۆڵوشیوێکی وشك بەسەرچوونی دەستەڵاتی ئەوەیە کەدەدرێتە پاڵی.

هەروەها گوتراوە: ئەگەر مرۆڤێك بینی بەمەلەکردن قوتاربوو بەڕلەوەی لەخەوەکەی بەئاگابێت باشترە لەبەئاگاهاتنیو هێشتا هەر لەئاوەکەدا مابێتەوە.

*ڕۆیشتن بەسەرئاودا لەدەریا یاخود ڕووباردا بەڵگەیە لەسەر باشی ئاینو دروستیو دڵنیایی.

*هەروەها گوتراوە: بەڵکو دڵنیادەبێت لەکاروبارێك کەواپێشتر گومانی هەبوە لەبارەیەوە یاخود سەفەرێکی مەترسیدار دەکات بەپشتیوانی خوداوەند.

*ئەگەر بینی ئاوبەسەریا دەڕوات ئەوا بەلاو نەهامەتی لەلایەن دەستەڵاتدارەوە ڕووی تێدەکات.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+جەنگاوەری ڕێگەبڕ.

+شێر.

+ئەوەی ڕێگەنیشاندەدات.

*ئەگەر بینی دۆڵو شیوێك بوو بەڕێگر لەنێوان خۆیو ڕێگەیەکیتر ئەگەر لەسەفەردابوو ڕێگەی لێدەگیرێ لەلایەن دز یان دڕندەیەك یاخود بەهۆی بارانو فەرمانڕەوایەکەوە، ئەگەر ئامادەبوو ئەوا غەمو پەژارە ڕووی تێدەکات بەپێی ئایەتی: ﴿مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ﴾(البقرة:٢٤٩).

*ئەگەر بینی لەنێو ئاوێکی قووڵی زۆردایەو دابەزیوەتە نێوی بەلام ئەگەیشت بەنێوەڕاستەکەی دنیاو خۆشیەکانی بەدەستدەهێنێ. هەروەها دەڵێن: بەڵکو دەکەوێتە نێوکاروباری پیاوێکی گەورەوە.

*خۆشۆردن بەئاوی سارد تەوبەو چاکبوونەوەیە لەنەخۆشیو دەرچوونە لەزیندانو قەرزدانەوەو دڵنیاییە لەترسوبیم.

*ئەگەر بینی ئاوێکی سازگاری زۆر دەخواتەوە تەمەندرێژیو ژینو بژێوییەکی باشی دەبێت، ئەگەر لەدەریا خواردیەوە ماڵوسامان لەفەرمانڕەواوە بەدەستدەهێنێ، ئەگەر لەڕووبارەوەبو لەپیاوێکەوە دەستی دەکەوێت کەوا حاڵی وەك حاڵی ئەو ڕوبارە وایە، ئەگەر لەبیرێك هەڵیگۆزت ماڵوسامانی بەفرۆفێڵو پیلان دەستدەکەوێ.

*ئەگەر بینی ئاوێك دەردەهێنێو باخو بێستانو کشتوکاڵی پێ ئاودەدات ماڵوسامانی لەلایەن ژنێکەوە دەستگیردەبێ، ئەگەر بێستانو کشتوکاڵەکە بەرهەمداربوو ئەوا لەژنەوە ماڵوسامانو منداڵ بەدەستدەهێنێ.

* ئاودانی بێستانو کشتوکاڵ جووتبوونە لەگەڵ هاوسەردا، ئاویش لەشووشەدا کوڕە ، ئەگەر پەرداخو شووشەکەشکاو ئاوەکەیش مایەوە ئەوا دایکەکە دەمرێو کوڕەکەی دەمێنێتەوە، ئەگەر ئاوەکە ڕژیو پەرداخەکە مایەوە کوڕەکە دەمرێو دایکەکە دەمێنێتەوە.

* لە(ئیبن سیرین)یان پرسی دەربارەی ژنێك کەوا لەخەودا بینیویەتی ئاودێریدەکات ، ئەویش وتی: با ئەوژنە لەخوابترسێو دووزمانیو درۆ لەنێوان خەڵکیدا بڵاونەکاتەوە.

* پیاوێك هاتو وتی: لەخەودابینیم لەپەرۆیەکی شرۆڵی جلەکانمدا ئاوێکی سازگاری خۆشم دەخواردەوە، ئەویش وتی: لەخوابترسە لەگەڵ ژنێکدا بەتەنیا دامەنیشە کەوا حەلاڵ نەبێ بۆت. ئەویش وتی: ئەو ژنە دەزگیرانمەوە دەستنیشانمکردوە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ژیانێکی خۆشە ئەگەر بینی ئەوا خۆشحاڵیو کۆکردنەوەی ماڵو دارایيو دەستکەوتو خێری زیادەیەو هاوسەرگیرییە بەپێی ئایەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا﴾(الفرقان: ٥٤).

* ئەگەر ئاوەکەی خواردەوە لەپەرداخێكو تێرئاو نەبوو ئەوا ژنەکەی یاخیبووە بەسەریدا، ئەگەر دەستی

لەنێوئاوەکەدا راخست ماڵو دارایی تێکەڵدەکاتو لێی ئاڵۆزدەبێت.

(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئاو لەخەودا فیتنەو ئاشوبە لەئایندا بەپێی ئایەتی: ﴿مَاءً غَدَقًا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ (الجن:١٦ـ١٧).

* هەروەها بەلاونەهامەتییە بەپێی ئایەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ﴾ (البقرة:٢٤٩).

* ئەگەر بینی ئاوی پادشاو فەرمانڕەوا سوێربوو یان چوو بەناخی زەویدا خوداوەند ئەوەی بەو فەرمانڕەوایەی داوە دەیگۆڕێ بەهۆی وازهێنانی لەسوپاسگوزاریو دەستبەرداربوونی لەخێر، هەموو ئاوێکی لێڵ ناڕەحەتیو قورسیو گرانییە.

* ئەگەر بینی ئاوی لەنێوجەرگەی بیرا رشت پارە خەرجدەکات بۆ ژنێك، ئەگەر لەشوێنێك قلپیکردەوە کەوا هیچ سوودێکی نەبوو بەو ئەندازەیە ماڵو سامانی لەکیسدەچێت.

* ئاوی زاڵبوو غەمو پەژارەیە لەگەڵ فتنەو ئاشوب بەئەندازەی خێرو توانای.

* ئەگەر بینی ئاوێك لەوڵاتێکدا زیادیکردوە یان لەگوندێکداو لەئەندازەی خۆی دەرچوەو دەچێتە نێو ماڵەکانو خەڵکەکەی خەریکە نوقم دەبن فیتنەیەکی مەزن ڕوودەداتو جیاوازیو دووبەرەکی دەکەوێتەوە بەڕادەیەك کەسانی دڕندە تیادەچن.

*ئەگەر خۆی لەنێو ئاوێکدا بینیەوە غەمو پەژارەو فتنەو ئاشوبە.
*ئەگەر بینی مەرکانەیەك ئاوی سازگاری هەیە ماڵێکی میراتییەو بۆی ماوەتەوە.
*ئەگەر بینی ئاودێریدەکات ئەوا لەنێوان خەڵکیدا دووزوبانو درۆدەکات.
*ئاوی راوەستاو زیندانییە، هەروەها گوتراوە: ئاوی لیّلّ دەستەلاّتدارێکی ستەمکارە.
*ئەگەر بینی لەئاوێکی لیّلّ خۆی شۆردو لیّی هاتەدەرەوە ئەگەر لەناڕەحەتیدابوو لیّی قوتاردەبیّ ، ئەگەر نەخۆشبوو خوداوەند چارەو شیفای دەدات ، ئەگەر زیندانیبوو قوتاردەبێت، ئاوی سوێر غەمو پەژارەیە، ئاوی رەش ئەگەر لەبیر دەرهێنرا ژنێکە دەیهێنێتو خێری تێدانییە.
*ئاوی سازگار رزقێکی حەلاڵەو دڵسافیو زانیاریو ژیانە بۆئەوەی لەلێواری مەرگ نزیکبوەتەوە بەپێی ئایەتی ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾(الأنبياء:٣٠).
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەر بۆ رەبەن.
*ئەگەر لەدەفرێکی حەلاڵدا خورایەوە مارەبڕینێکی دروستە، ئەگەر لەدەفرێکی حەرامدابوو مارەبڕینێکی خراپو بەدە.

*دەگونجێت ئاوخواردنەوە بەڵگەبێت لەسەر خواردنەوەی هەژاران یان ئەوەی لەنێوان خۆیاندا دەیخۆنەوە.
*ئەگەر بینی تینوویەتیو ئاو دەخواتەوە روەکەکەی دەژێتەوەو ترسو بیمی دەڕەوێتو دەوڵەمەند دەبێتو خانەوادەکەی یەکدەگرنەوە، ئەگەر خۆی پیّ شت هیچ زیانێکی تێدا نییەو دانەوەی قەرزە.
*ئەگەر ئاوی سازگار سوێربوو لەئاینەکەی پاشگەزدەبێتەوەو دەگەڕێتەوە سەر وێڵیو سەرگەردانی یان کاروبارەکانی قورسو گران دەبن لەسەری.
*ئەگەر ئاوی لەدەفرێکدا هەڵگرت ئەوا هاوسەرەکەی دووگیاندەبێت.
*زۆربوونی ئاو لەچەن دەفرێکدا بەڵگەیە لەسەر ستەمو گرانیو جیاوازی راوبۆچوون.
*ئاوی سازگار بەڵگەیە لەسەر سەلامەتی چاو لەئێشو ئازار.
*ئەگەر بینی ئاو دەمژیّ بژێوی لیّلّو گرانە.
*ئەگەر بینی ئاوێکی گەم کرا بەسەریا لەلایەکەوە کەوا نەیدەزانی تووشی لەرزوتا دەبیّ یان نەخۆشدەکەویّ یاخود غەمو پەژارەیەکی قورسوگران رووی تێدەکات بەئەندازەی گەرمیەکەیو، ئەگەربینی جلەکانی یان عەباکەی تەڕبوو لەسەفەر دەوەستیّ

یـان ناگـات بـەکاری خـۆی کـەوا ئامادەکاری بۆ کردووە.
*ئەگـەربینی ئـاوی لەدەفرێکـدا هـەڵگرتووە ئەگـەر هـەژاربوو مـاڵو سـامانی دەسـتدەکەوێ ، ئەگـەر دەوڵەمەنـدێکی رەبـەنبوو هاوسـەر دەگرێ ، ئەگەر هاوسەرداربوو ژنەکەی دووگیاندەبێت.
*ئەگەربینی ئاو لەتوورەکە یان جلێکدا هەڵدەگرێ یان لەشتێکدا کەوا ئـاوی تێدا هەڵناگیرێ لەخۆبای بووە بەهۆی ماڵو دارایی و سامانەوە.
*ئەگەر ئاوێکی لەپەرداخێکی شووشە یان لەجامێکدا پێدراو هاوسـەرەکەی دووگیـانبوو یـەکێکیان لەدەسـتی کەوتـەخوارەوەو وشـکا ئـەوا هاوسەرەکەی دەمرێ، ئەگەر ئاوەکەی رۆیـیو پـەرداخو جامەکـە نەشـکا کوڕەکـەی دەمـرێو ژنەکـەی سەلامەتدەبێ.
*ئەگـەر ئـاوی لەگۆزەڵەیـەك یـان پەرداخێك خـواردەوە ئەگەر رەبەنبوو هاوسەر دەگرێ.
*ئەگـەربینی ئـاوی کوپەیـەك یـان مەرکانەیـەك خاڵیدەکاتـەوە ژنێـك دەهێنێ.
*خۆشـۆردن بـەئاوی سـارد تەوبـەو شـیفایە لەنەخۆشـیو قوتاربوونـە لەزینـدانو قەرزدانـەوەو دڵنیابوونـە لەترسو بیم.

*ئەگەر ئاوێکی لەبیر دەرهێنا بەفرۆێڵ ماڵو سامانی دەستگیر دەبێت.
*ئەگـەر ئاویـدەرهێناو ئـاوی بێستانو کشتوکاڵیدا لەو ژنە کوڕێکی دەبێت.
*ئـاودانی بێـستانو کـشتوکاڵ جووتبوونە لەگەڵ هاوسەردا.
**ئـاواز((سـەدا)):** (نابلـسی)دەڵێـت: لەخەودا هەواڵێکی باشە، بۆیـەکێکیش گوێبیـستی بێـت هـەواڵو دەنگوباسـی ناخۆشییە.
*ئەگـەر خـۆی ئـاوازو سـەدای پێپەیـداکردبوو دەنگوباسـی نـاخۆش دەگەیەنێت بەمرۆڤێك.
*ئەگـەر بلـوێرێکی بەدەسـتی خۆیـەوەبینیو دەسـتی دەخـستە نێـو کـونی بلوێرەکـە فێـری قورئانـدەبێتو دەزانێت چیدەخوێنێت.
*ئەگـەر لەلایـەن دەسـتەڵاتدارەوە بلوێرێکی پێدرا دەستەڵاتو قوتـاربوون لەفیتنــە بەدەسـتدەهێنێت لەگـەڵ خواناسیو گۆشەگیری لەخەڵکی.
**ئاوبـەنگ:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: هەرکەسـێك ببینـێ ئاوبـەنگی کـردوە کەسێکی چاو نەترسە لـەگوناهو تـاوان ئەنجامـدانو، سـزایەك دادەبارێـت بەسەریا هەتا تەوبە بکاتو پەشیمان ببێتەوە.
**ئـاوخوازیی:** (نابلـسی) دەڵێـت: ئـاوخوازی لەخـەودا نەخۆشـیەکی ناسـراوەو بەڵگەونیـشانەیە لەسـەر رسوایی و ملکەچی.

**ئاودان( ئاودێری ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دوای تینوویەتی بەڵگەیە لەسەر:
+ئاسانی دوای ناڕەحەتی‌و بەدەستهێنانی پێداویستی.
+دەوڵەمەندی دوای هەژاری.
+تەوبەکردن‌و چاکبوونەوە لەدەردو نەخۆشی.
+بەدەستهێنانی ئەو زانیاری‌و کردارەی لەکیسیچوە.
*هەروەها (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئاودێری چاکسازییە لەئایندا.
*ئەگەر بینی تێرئاوبوە بەڵگەیە لەسەر دروستی ئاین‌و جێگیربوونی.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا چاکەکردنە لەگەڵ کەسی نزیک‌و دوورو باش‌و خراپ.
**ئاوریشم:** ماڵێکی بێشومارە ، ئەگەر بینی جلوبەرگێکی ئاوریشمی پۆشیوە ئەو (حەج)دەکات ، ئەگەر جلوبەرگەکە سووربوو دنیای بۆ نوێدەبێتەوە، ڕەنگی زەردیش ئاوەڵابوونی دنیایە لەگەڵ نەخۆشیدا ، هەموو ئاوریشمێك ماڵ‌و داراییە بۆ یەکێك بیپۆشێت جگە لەڕەنگی زەرد نەبێت.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا بوە بەخاوەنی ئاوریشم پیاوێکی ئاینداری خواناسەو پلەوپایەو دەستەڵات بەدەستدەهێنێت یاخود ژنێکی ڕێزدارو داوێنپاك دەهێنێت کەوا خاوەن کەسێتی‌و پلەوپایەیە.
*ئەگەر بینی ئاوریشمی پۆشیوەکچێك دەکات بەهاوسەری کەخەڵکی وڵاتێکی دوورە.
*ئاوریشم بۆ زانایان بەڵگەیە لەسەر داواخوازی دنیاو بانگکردنیان بۆکاری ڕاهێنراوو بیدعە.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر عیشق بۆئەوەی دەیبینێ، بۆ پۆشەریشی لەفەرمانڕەو گەورەپیاوان فیزو خۆنواندنە.
*ئەگەر ئاوریشم بەمردوەوە بینرا نیعمەت‌و بەخششی وەرگرتوە.
*ئاوریشمی زەردو سوور نەخۆشییە، هەروەها گوتراوە نەخۆشی نییەو جوانی‌و ڕازاوەیی پیاوە لەجەنگدا.
*جلوبەرگی ئاوریشم بۆ زانایان بەڵگەیە لەسەر خوازیاربوونیان بۆ دنیاو بانگکردنی خەڵکی بۆ بیدعەو، بۆ خەڵکی تریش بەڵگەیە لەسەرئەوەی ئەنجامیدەدات‌و بەهۆیەوە شایستەی چوونە نێو بەهەشت دەبێت.
*هەروەها ئاوریشم بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی ڕێزدارو بەئابڕوداو دڵخۆشبوون بە ژنێکی جوان‌و شۆخ.
**ئاوریشمساز( ئاوریشمفرۆش ):** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پۆستەو هەواڵ‌و

تـەبایکاری دڵان و چـاکەکار لـەنێوان خەڵکیدا.

*دەگونجێـت بینینـی بـۆ رەبـەن بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرگیری.

**ئاوریشمی:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی شتومەکی ئاوریشمی بەڵگەیە لەسەر شـایی و ئاهـەنگ بـەهۆی ئـەو رەنگـە کراوانەی لەخۆیگرتووە.

*دەگونجێـت بینینـی جل وبـەرگی ئاوریشمی لەبەری زانایەکدا بەڵگەبێت لەسـەر ئـەو رووداوانـەی کـەوا غـەم و پەژارەو گرفت دەرەوێنێتەوە.

**ئاوڕدانەوەی مرۆڤ:** ئاوڕدانـەوەی مـرۆڤ لەخەودا چاوبرسێتی و تەماعە بەتایبەت ئاوڕدانەوە لەنوێژدا.

*ئەگەر ئاوڕدانەوەکە لەبەر رووداوێکی مەترسیداربوو خۆی لێدەپاراست وەك مار یان شێر بەڵگەیە لەسەر وریـایی و ئاگـاداربوون لـەژن و مـاڵ و منـاڵ، ئاوڕدانەوەش لەنوێژدا بەڵگەیە لەسـەر چاوبڕینە دنیـاو پـشتکردن لەقیامـەت و ئاوێتەبوونی حەزو ئارەزوو.

**ئـاوزەنگ:** (نابلـسی) دەڵێـت: ئەگـەر لەخەودا بەتەنیا بەبێ زین بینرا کوڕە ، ئەگـەر لەگـەڵ زینـدابوو پـشت بەکوڕەکـەی دەبەسـتێ لەکاروبارەکانیدا.

*هـەروەها دەڵـێن: عـەورەتی ژنـە، ئەگـەر بینـی قاچـی راسـتی دادەنـێ لەدواوە دەچێتە لای ژنەکەی.

*ئـاوزەنگ بەڵگەیـە لەسـەر ئـەو حوشترەی مرۆڤ سواریدەبێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+پشوودان دوای هیلاکی و ماندوبوون.

+خزمـەتکردن بـۆ بێکاروئـەوە لەسەفەردایە.

+حەسیرو زەوی و راخەر.

*دەگونجێـت دوو سـوار بەڵگـەبێت لەسەر هەردوو هاوسەر یان باوك و دایك یاخود دوومنداڵ.

*سـوارە مـاڵێکی پـیرۆزە لەگـەڵ پلەوپایـەو خـشڵی زۆرو بەرزبوونـەوەی یـادو زیکـرەو، ئەگـەر خـشڵەکەی لەزێڕبوو زیانی نییە.

*سوارە بەڵگەیەلەسەر کچێکی جـوان و شۆخ و شەنگ، ئەگەر لەئاسنبوو ئـەوە هێـزو توانـای خەوبینـەر دەردەخـات، ئەگـەر قورقـشمبوو بەڵگەیـە لەسـەر خەم و پەژارەی دنیایی، ئەگەر لەزیوبوو بـەڵام بـەزێڕ رووکەشـکرابوو بەڵگەیـە لەسەر کچ و کوڕی جوانکیلە.

*ئەگـەر بینـی ئەسـپ و ئۆتومبیلەکـەی دزرا یان بـچڕا خزمەتکارەکـەی دەمـرێ یادەستبەرداری دەبێت.

**ئـاوکێش( ئاویـەر):** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: ئـاوکێش پیـاوێکی ئاینـداری خواناسـەو خێروچـاکە لەسـەر دەسـتی ئەودا بەدی دێت ، ئەگەر پارەی لەسەر وەرنەگرێ ، ئەگـەر پڕیکـردو هـەڵیگرت بۆ ماڵەکەی و نەیویست بیخواتەوە ماڵ و

سامان کۆدەکاتەوەو کەسانی دی دەیخۆن.

*ئەگەر ئاوەکەی هەڵگرت بۆ پیاوێك‌و پارەی لەسەر وەرگرت گوناهو تاوان دەخاتە ئەستۆی‌و ئەوەی بۆی هەڵگیراوە ماڵ‌و سامانە لەلایەن دەستەلأتدارەوە بەدەستی دەهێنێت، چونکە روبارو ئاو ماڵ‌و سامانی جەمکراوە.

*ئەوەی ئاو دەدات بەخەڵکی بەجام‌و شەربە خاوەن چاکەو ئاین‌و زانیاری‌و مۆچیارییە.

*ئەوەی کوندەو شەربە هەڵدەگرێ ئەسپەردەپارێزە.

(نابلسی) دەڵێت: ئاودانی ئاژەڵ بەڵگەیە لەسەر سوودوەرگرتن لەسەفەردا، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەو خێرو چاکەیەی بەرپایدەکات لەنێوان خەڵکیدا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو دەلأڵەی شتومەك دەبات بۆ خاوەنەکانی.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر شەڕو ئاژاوەو سەماو سوڕدان‌و خولانەوە.

**ئاوڵە**:(ئیبن سیرین)دەڵێت ئەگەر بینی ئاولاویبووە ماڵ‌و دارایی زیاد دەکات، ئەگەر کوڕەکەی بینی ئاولاویبوە ماڵێکی زیادەی دەستدەکەوێت، هەروەها برین‌و زامداریش زیادبوونی ماڵ‌و سامانە.

*ئەگەر برینی بەدەستی خۆیەوەبینی‌و کێمی لێدەڕۆیی ماڵ‌ودارایییەکە سوودی لێوەردەگرێت.

(نابلسی)دەڵێت: ئاوڵە لەخەودا قەرزو داواکارییە، هەروەها دەڵێن: ئاوڵە بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی ماڵ‌و دارایی.

**ئاوەڕۆ**:(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئاوەڕۆ بەڵگەیە لەسەر دەم‌و گەردن‌و کانی‌و سەرچاوەی ئاو بەهۆی لەبەر ڕۆینی لەسەرەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رزق‌و رۆزی، ئەگەر ئاوەڕۆی خەڵکی بینی لەکاتی باراندا دەڕۆی‌و خەڵکی لەناڕەحەتی‌و غەم‌و پەژارەدابوون ئەوا رزق‌و رۆزییان دەبوژێتەوەو غەم‌و پەژارەشیان دەڕەوێتەوە.

*بەلأم ئەگەر بەبێباران ئاوەڕۆکە ئاوی لەبەر ڕۆیی فتنەو ماڵ‌و سامانی حەرامە.

*لەبەر ڕۆینی ئاوەڕۆ لەمالأندا بۆیەکێك سووربێت لەسەر کوڕ نائومێدییەتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەرچاوەی کانیاوەکان لەگەڵ هەوری پڕ باران‌و ئاو.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی چاکەکاری ناسراوە لەهەندێك کاتدا.

*ئاوەڕۆ بەڵگەیە لەسەر خزمەتکارو بەردەست ئەوانەی بەرژەوەندی شوێن‌و جێگە دەپارێزن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نوێنەری ئەمانەتپارێز خیانەت‌و ناپاکی

لەئەسپەردە ناكاتو حەقو مافی هەموو كەس دەدات.
*ئەگەر خوێنی لەبەر رۆیی بەڵگەیە لەسەر دوژمنێكی خوێنڕێژ خوێنی خەڵكی ئەو وڵاتە دەڕێژێ.
*ئەگەر ئاوێكی سازگاری لەبەر رۆییو خەڵكی سوودی لێوەرگرت بەڵگەیە لەسەر ئەمنو ئاسایش.
*ئەگەر ئاوێكی لێڵی لەبەر رۆیی یاخود بۆنێكی ناخۆشی هەبوو بەڵگەیە لەسەر دومەڵو ئاوڵەو هاوچەشنەكانی.
*ئەگەر لەمزگەوتێكدا ئاوەڕۆ بینرا یاخود لەشوێنێكی دیاردا ئەوا حوكمەكەی وەك ئاوی (زەمزەم) وایە.
**ئاوی پاڵفتەكراو:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر منداڵی رووجوان یان كەسانی رێزدار، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانیاریو دانایی بەرێز لەزانایانەوە ، ئەوەشی بۆندەكرێ وەك ئاوی گوڵاوو نەسرین دڵخۆشییە لەگەڵ پیاهەڵدانی جوانو بەجێ یاخودماڵو سامانی بێشومار بەپێی كەمورۆری.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەمانەت یاخود شتی دزراوو داگیركراو بەزۆر.
*ئاوی پاڵفتەی خواردنەوە واژووی ئاویترە ئەمانەو هاوچەشنەكانی داوودەرمانو سوودو رزقو رۆزیو شادییە بەپێی زۆریو كەمی لەخەودا.
**ئاوی سارد:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ژنێكی سەلارەو پلەوپایەبەرزو خاوەن خزمەتكارە، خواردنەوەشی ماڵو داراییەكە بەدەستی دەهێنێت.
**ئاوێنە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر رەبەنێك تەماشای رووخساری تێداكرد ئەوا ژندەهێنیو رووی تێدەكات، ئەگەر ژنی دووگیانی هەبوو هاوچەشنی ئەوەی دەبێت ئەگەر تەماشاكار نێربێ یان مێ.
*ئاوێنە بەڵگەیە لەسەر جیابوونەوەی هەردوو هاوسەر.
*بۆكەسێكی موسافیر بەڵگەیە لەسەر گەشتو سەفەر هەتا رووخسارو دەموچاوی دەبینێ ئەمەش بەڵگەیە بۆی لەسەر گەشتوگوزار.
*ئەگەر بۆیە تەماشای ئاوێنەیكرد هەتا خۆی چاكبكات یان چاوەكانی بڕێژێ ئەوا تەماشای كاروباری براكانیدەكات.
*دەگونجێت ئاوێنەكەی بەڵگەبێت لەسەر دڵی ، ئەگەر ژەنگی پێوە بینی گوناهو تاوانە لەسەر دڵی كۆبوەتەوە.
*تەماشاكاری ئاوێنەی زیو خراپەیەك روودەكات رێزو شكۆی، دەگونجێت لەهاوسەرەكەی جیاببێتەوەو هاوتایەكی خۆی بدۆزێتەوە.
*هەروەها دەڵێن: ئاوێنە پیاوەتی پیاوەو پلەوپایەیە بەپێی گەورەیی ئاوێنەكە، ئەگەر دەموچاوی خۆی تێدا بەگەورەی بەدیكرد ئەوا جوامێری چاكو باشدەبێ.
*ئەگەر ریشی خۆی بەرەشی بەدیكرد لەگەڵ رووخسارێكی جوانداو

لەوحاڵەشدا نەبوو لەكاتی بێداریدا ئەوا ڕێزی لێدەگیرێو كاروباری باش لەدنیادا ئەنجامدەدات.

*ئەگەر بینی ریشی شانەكراوەو ڕێكە ئەگەر بەسپێتی بەدیكرد هەژار دەكەوێو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوەو ئاینی بڵندەبێت ، ئەگەر مووی سپی لەرووخساری لەشوێنێكدا بەدیكرد كەوا مووی تێدا دەرنەدەهات شكۆمەندی دەڕواتو ئاینەكەی پتەوو بەهێز دەبێ، بەهەمان شێوە تەماشاكردنی ئاوێنەی زیویش بەو شێوازەیە شكۆمەندی و ڕێز دەشكێنێ.

*یەكێكیتر دەڵێت: ئاوێنە ژنە ، ئەگەر لەئاوێنەدا ڕێی ژنی بینی دەرووی لێدەكرێتەوە.

*تەماشاكردنی ئاوێنەی هەڵواسراو غەموپەژارە دەهێنێو تەماشاكردنی ئاوێنەی ژەنگاوی خراپی حاڵوبارە.

*ئەگەربینی تەماشای ئاوێنە دەكاتو لەغەمو پەژارەدابوو داواخوازی دەرووی خێرە ، ئەگەر نەیتوانی تەماشای بكات بەهۆی ژەنگەوە دەرووی لێناكرێتەوە.

*ئەگەر بینی دەڕوانێ بۆ ئاوێنەو ڕەبەنبوو هاوسەردەگرێ، ئەگەر ژنەكەی لەوێنەبوو بەهەمان شێوە هاوسەر دەگرێ.

*ئەگەر تەماشای ئاوێنەیكردو بینی ژنەكەی كاری داوێنپیسی ئەنجام دەدات ئەگەر دەستەلاتداربێت هاوسەردەگرێو ئەگەر بازرگانبوو كاڵاكەی تیادەچێ.

*ئەگەر ژنێك تەماشای ئاوێنەیكردو دووگیانبوو كچێكی دەبێت لەخۆی دەچێت یان كچەكەی كچی دەبێت، ئەگەر هیچكام لەوانە نەبوو مێردەكەی ژن دەهێنێ بەسەری كاتێ دەیبینێ لەخۆیدەچێت.

*هەروەها ئەگەر منداڵێ تەماشای ئاوێنەیكردو بینی باوكو دایكی لەدایكدەبوون برایەكی هاوچەشنی دەبێت، بۆ كچیش بەهەمان شێوازە.

*هەروەها ئەگەر پیاوێك تەماشای ئاوێنەیكردو دووگیانێكی هەبوو كوڕێكی دەبێ لەخۆیدەچێ.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا خەیاڵو لەخۆباییبوونە، هەروەها گوتراوە ژنێكی ئاین كزو لاوازە.

*ئەگەر تەماشای ئاوێنەیكرد یان وێنەو شێوەی خۆی تیابینی كوڕێكی هاوشێوەی خۆی دەبێ لەرەنگو پیشەدا.

*ئەگەر تەماشای ئاوێنەیكرد ژنێك دەهێنێ، ئەگەر ژنەكەی ئاوارەبوو یان لەسەفەردابوو دەگەڕێتەوە، ئەگەر ئاوێنەكە شكا ژنەكەی دەمرێ.

*ئەگەر تەماشایكرد لاوو جەحێلێكی تێدابینی لەشوێنی خۆی دوژمن یا دەستەلاتدارێك دەبینێ ، ئەگەر پیاوێكی بەتەمەنبوو هاوڕێیەكی لەوشوێنەدا دەبینێ.

* ئەگەربینی تەماشای ئاوێنەدەکات خوداوەند لێی رازی نییەو سەرپێچیکاری پەروەردگارە بەنهێنیو ئاشکراو کەموکوڕی روودەکاتە ماڵو دەروونی.
* ئەگەر تەماشای ئاوێنەیەکی زیویکرد ناڕەحەتیو غەموپەژارەو ترس وبیم رووی تێدەکات.
* ئاوێنەی زێڕ هێزە لەئایندا و دەوڵەمەندییە دوای هەژاریو دەستەڵاتە پاش لابردنو لەکارخستن.
* ئەگەر نەخۆشێك تەماشای ئاوێنەیکرد بەڵگەیەلەسەر مردنی ئەگەر خۆی بەشێوەیەکی جیاواز لەشێوازی جارانی بینی ماڵو سامانو ژێری تووشی گرفتو نەهامەتی دەبێت.
* ئەگەربینی بوە بەژن کچی دەبێت یاخود ژندەهێنێ کچێك بەخێودەکات.
* ئەگەر شێوەی ژنێکی تێدابینی سەردانی هاورێکەی دەکات، ئەگەر ژنێك خۆی بینی لەئاوێنەدا ئەگەر دووگیانبوو منداڵەکەی کچ دەبێ، ئەگەر دووگیان نەبوو مێردەکەی ژندەهێنێ بەسەریا.
* ئەگەر کەسێکی زیندانی رووخساری خۆی لەئاوێنەدا بینی لەزیندانەکەی قوتار دەبێ.
* ئەگەربینی خۆی بوە بەئاوێنەو تەماشاینەکرد شتێکی بەسەردێت کەوا رقی لێدەبێتەوە.

**ئاهەنگ( شایی ):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا ئاهەنگەکە رووداوێکی تێدابوو پێی خۆشنەبوو بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە بەپێی ئایەتی: ﴿لاَ تَفْرَحْ إِنَّ اللهَ لاَيُحِبُّ الفَرِحِينَ﴾ (القصص:٧٦).
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خەریکبوون بەگوێڕایەڵییەوە.
* ئەگەر ئاهەنگ بەبۆنەی رووداوێکی خۆشەوەبوو وەك قوتاربوونی زیندانی یان چاکبوونەوەی نەخۆش باشو شادیهێنەرە.
* ئەگەر لەخەودا ئەوەی راگەیاند کەخۆشی دەهێنێت لەکاتێکدا غەمهێنەربوو وەك ئەوەی لەخەودا بەیەکێك بگوترێ فلانەکەس لەسەفەرگەڕاوەتەوەو لەکاتێکدا ئەوکەسە مردبێ ، هەروەها بەڵگەیە لەسە رەواندنەوەی ناخۆشی.
* ئاهەنگو شایی لەخەودا غەمو پەژارەیە ، ئەگەر بینی ئاهەنگ دەگێڕێ ئەوە غەمو پەژارە رووی تێدەکات.

**ئایەتەکانی قورئان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سەبارەت بەو ئایەتانەی باس لەنیشانەکانی قیامەت دەکەن ترسو رووداونو پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَمَانُرسِلُ بالآيَاتِ إلا تخويفا﴾.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاتنە گۆی ئەو بوونەوەرەی خودا لەقورئاندا

باسیکردووەو تێیدا کۆمەڵێك تیادەچن‌و کۆمەڵێکیش قوتار دەبن.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ئایەتەکانی سۆزو بەزەیی‌و ڕەحمەتبوو بۆ مردوو سۆزو ڕەحم‌و بەزەییە ئەگەر خەوبینەر دەیخوێند بەسەریا.

*ئەگەر ئایەتەکانی سزاو خەشمبوو سزایە لەلایەن خوداوە، خۆ ئەگەر ئایەتەکانی ئاگاداری‌و بێدارکردنەوەبوو ئەوەی بینیویەتی‌و قورئان بەسەرا خوێندرا زیندوبوو ئاگاداری دەکەیتەوە لەوەی نەکەوێتە خراپەو کاری نابەجێوە، ئەگەر ئایەتەکان مژدەیان هەڵگرتبوو بەخێرو چاکە مژدەی پێدەدەیت.

*ئەوەی ببینێ ئایەتی سزا دەخوێنێتەوەو کاتێ دەگات بە ئایەتەکانی قورس‌و گران بێت لەسەری خۆشی رووی تێدەکات.

*ئەوەی ببینێ ئایەتی سۆزو بەزەیی دەخوێنێتەوەو خۆی بۆئامادە نەکردبێت هەر لەناڕەحەتیدا دەمێنێتەوە.

**ئـو**

**ئوتومبیل:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ڕێکخستنی بژێوی خەوبینەر.

*ئەگەر بینی سواری ئوتومبیل بوەو لەنێویدا چەن کەسێکی تێدابوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی خەوبینەر کۆمەڵێکی زۆر تووشی وەسوەسە دەکات یان منداڵی ئاقڵ‌و ژیری دەبێت.

*ئەگەر کەسێك بینی خوازیاری سەفەربوو بەڵگەیە لەسەر دواخستنی سەفەرو قورسی ئوتومبیل‌و ڕۆینی.

*ئەگەر خۆی هەڵواسیبوو بەئوتومبیلەکەوە یان بەکێشیدەکرد شوێنی دەستەڵاتدار دەکەوێ‌و بەئەندازەی زاڵبوونی بەسەر ئوتومبیلەکەدا.

*ئەگەر بینی سواری ئوتومبیل بوەو باری قورسی هەڵگرتوە غەم‌و پەژارە رووی تێدەکات.

*ئەگەر ئوتومبیلی گواستنەوەبوو بەجێهێنانی پێداویستی‌و خاڵیکردنەوەی غەم‌و پەژارەیە.

*ئەگەر پەکیکەوت تووشی سەرسامی دەبێت بەهۆی خراپی متمانەبوون بەکەسێك کەوا شایستەی نییە.

*ئەگەر ئوتومبیلی گواستنەوەی کرێبوو مێشك سافی‌و ژینێکی خۆش بەهۆی هەوڵی تایبەتی خۆیەوە بەدەستدەهێنێ ، بەلاّم ئەگەر هۆکارێکی گواستنەوەی ناسراودیاربوو پەیوەندییەکی نامۆو ئابڕوچوونە یان گواستنەوەی هەواڵی درۆیە.

*ئەگەر ببینێت بووە بەخاوەنی ئوتومبیلێك سەراپای کارەکانی بەدەستی خۆیدەبێت.

**ئـۆ**

**ئۆف (ئاخ):** (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی لەخەودا ببینێ وشەی (ئۆف و ئاخ) دێت بەزاریا ئەوا ئازاری دایك و باوكیداوە. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا﴾.

**ئــە**

**(ئەبوبەكری صدیق) (ﷺ):** (نابلسی) دەڵێت: بینینی (ئەبوبەكر)ی (صدیق) لەخەودا نیشانەو بەڵگەیە لەسەر دەستەڵاتو پێشەوایەتیو پێشكەوتن بەسەر هاوەڵاندا.

* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر بەخشین لەپێناوی خودایا بەماڵو منالْ یاخود پاراستنی هاوەڵایەتیو ئەمەكداری.

* بینینی بەڵگەیە لەسەر ئازادكردنی كەسانی چەوساوەو كۆیلە یاخود بەدەستهێنانی شەهیدبوون.

* سەراپای خەوبینین بەو زاتەوە بەڵگەیە لەسەر ناخۆشیو دەردەسەری رێی هەندێك لەوەچەو نەوە واتە كورو كچ.

* بینینی بەڵگەیە لەسەر ترسو بیمو خۆشاردنەوەو رزگاربوون لەناڕەحەتیو تێكۆشان لەپێناوی خودایاو (حەج)و سەركەوتن بەسەر دوژمنانی خودایا.

* ئەوەی (ئەبوبەكر) ببینێ بەزیندوێتی دڵنەرمو بەسۆز دەبێت بۆ بەندەكانی خودا.

* ئەوەی ببینێ دانیشتووە لەگەڵی شوێنی حەقو ڕاستی دەكەوێتو پەیڕەویی سوننەت دەبێتو، ئامۆژگاری شوێنكەوتوانی پێغەمبەر(ﷺ) دەكات.

* هەروەها (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەركەس (ئەبوبەكر) بەڕوویەكی گەشو جوانەوە ببینێ بەڵگەی بەدەستهێنانی زانستو زانیارییە.

**ئەرخەوان:** (نابلسی) دەڵێت: ئەرخەوان لەخەودا ژنێكی داوێن پاكە، ئەوەی بیدۆزێتەوە قایل دەبێت بەژنێكی دەوڵەمەندی جوان.

**ئەرمیا(ؑ):** (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی لەخەودا بیبینێت بەڵگەیە لەسەر گرتیبەربوونو كەوتنەوەی ئاگر لەوڵات یانماڵدا.

**ئەزا[1]:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێكی خۆش مامەڵەو ناوخۆشە بەهۆی نوری رووخسارییەوە.

**ئەژدیها:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی بوە بەدێو ئەژدیها تەمەنی درێژدەبێتو دەستەڵاتو فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت، ئەگەر لەگۆشتەكەی خوارد ماڵو دارایی بەهۆی دەستەڵاتەوە بەدەست دەكەوێت.

* دێو پیاوێكی دوژمنەو دوژمنایەتی خۆی دەشارێتەوە.

* ئەگەر چەن سەرێكی زۆری هەبوو فڕوفێڵی زۆری دەبێت لەشەڕو خراپەدا.

---

[1] **ئەزا:** جۆرە درەختێكە. (وەرگێڕ)

*ئەگەر خاوەن دووسەربوو یان سێ یا چوار تا حەوت ، هەر سەرێکی بەلاو نەهامەتیەکەو هونەرێکی شەڕەنگێزییە، ئەگەر بوو بەخاوەن حەوت سەر لەشەڕو خراپەو دوژمنایەتیدا بێهاوتا دەبێتو کەس خۆی بۆ ناگرێت، ئەم ئاژەڵەش بۆنەخۆش بەڵگەیە لەسەر مردن.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا دەستەڵاتدارێکی ستەمکارە یان ئاگرێکی سوتێنەرە ، ئەگەر سەرێك یان سێ سەری هەبوو خراپترە .

*ئەگەر نەخۆش ئەژدیهای دی بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*ئەگەر ژنێك لەخەودا ئەژدیهایەکی خستەوە منالێکی دەبێت بەردەوام نەخۆشدەبێت.

*ئەگەر یەکێك بینی ئەژدیها بەکێشی کرد بۆ دەریا سزایەکی لەلایەن فەرمانڕەواوە پێدەگات یان لەلایەن پەروەردگارەوە یان لەلای سەرۆکەکەیەوە.

*دەگونجێت ئەژدیها بەڵگەبێت لەسەر رۆژگارێکی دوورو درێژ بەهۆی درێژییەوە.

*ئەگەر مرۆڤێك بینی رووبەرووی هاتو هیچ زیانێکی پێنەگەیاند یاخود شتێکی پێدا یان بەزمانێکی پاراو لەگەڵی دوا بەڵگەیە لەسەر نووسینی خێرێکی زۆر لەچارەی.

*ئەگەر ئەژدیهایەکی بینی گۆڕاو پیاوی لێدەرچوو بەڵگەیە لەسەر جنۆکە.

*ئەگەر بینی دەگۆڕێتو ژنی لێدەبێتەوە بەڵگەیە لەسەر سوپایەکی مێینەی جۆنکە.

*ئەگەر بینی بووە بەخاوەنی ئەژدیهایەك زەفەر بەپیاوێکی بێ ئەقڵ دەبات.

*ئەگەر ژنی دووگیان بینی ئەژدیهای دەبێت کوڕێکی وتاربێژی زمان تیژو رەقی دەبێت کەدوو ناو هەڵدەگرێ، یاخود رمڵ لێدەری دەبێت یان درندەو پیاوخراپو لەئەنجامیشدا لەگەردنی دەدرێت.

**ئەژنۆ( چۆك )**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەژنۆ هەوڵو ماندبوونە بۆ بژێوی و رزقو رۆزی.

*ئەگەر بینی شتێکی لێبەسەرهاتوە دەدرێتە پاڵ ئەژنۆ، هێزو توانای پێستی هێزو توانای بژێوییەتی، گرووکردنی پێستەکەی زیادماندوبوونو دەرکەوتنی گرێو لوەو بەدەستهێنانی ماڵو داراییە بەماندبوونو هیلاکی.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر نەخۆش ئاوی لەئەژنۆیدا بینی یاخود نەخۆشێکی بینی بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*هەروەها دەڵێن: هەردوو ئەژنۆ دەبێت بەهێزو توانای جەستە لێکبدرێتەوە لەگەڵ جموجووڵو چاکی کارکردنیان، هەروەها سەفەرو جموجووڵی زیادەیە.

*ئەگەر نەخۆشیو نادروستی تێدا بەدیکردن بەڵگەیە لەسەر قورسیو هەردوو ئەژنۆ لەکرداردا.

(نابلسی) دەڵێت: ئەژنۆ بۆ کەسی موسافیر کەشتیو سەرنشینەکانیەتی، هەر رووداوێك تێدا روودەدات دەدرێتە پاڵ ئەوەی لێی دواین.

*هەردوو ئەژنۆ بەبراو شەریك لێکدەدرێتەوە.

*هەردوو ئەژنۆو قاچو خزمەتکارە.

*دەگونجێت ئەژنۆ بەڵگەبێت لەسەر:

+کڕنووشی تەواو.

+بەخشینو جموجووڵو هێوری.

+سەفەرو جێنشینبوونی.

+ئەو ماڵو داراییەی کۆیدەکاتەوەو خەرجیدەکات.

+هاوەڵایەتیو خۆشەویستی.

*ئەگەر بینی ئەژنۆی گەورەبووە یاخود ئێسقانەکەی گەورەیە حاڵوباری باشبوو ئەگەر لەناڕەحەتیدابوو دەرووی لێدەکرێتەوە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بینینی لەیەك جیابوونەوە یاخود کارەساتێکی پڕ ناسۆری یان خوێن لەبەررۆینو نەگیرسانەوە، یاخود هەڵچوونو شکانی دەقی بێدەنگی، ئەگەر نیازی سەفەری هەبوو دادەنیشیو سەفەر ناکات، دەگونجێت نەتوانێت سوود لەماڵو سامانی وەربگرێ ، ئەگەر لەنێوان ئەو یەکێکیتردا خۆشەویستی هەبێت ئەوە دەبچڕێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پەککەوتنی ئاژەڵو ئوتومبیلو هۆکاری گواستنەوە.

**ئەسپ:** ئەوەی شیری ئەسپ بخواتەوە خێرو چاکەی لەلایەن فەرمانڕەواوە دەستگیر دەبێت.

*ئەسپو ماین دەستەڵاتو شکۆمەندییە.

*ئەگەر بینی بەسواری ئەسپێکەوەیەو بەهێواشی دەڕوات بەڕێوەوەو سەرجەم پێداویستیەکانی ئەسپەکە تەواوە شکۆمەندیو رێزو گەنجی بەئەندازەی رامبوونی ئەسپەکە دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر ئەسپێکی بۆ خۆی بەستەوە یان ئامادەیکرد یاخود بوو بەخاوەنی بەهەمان شێواز دەبێت.

*هەر ناتەواوییەك رووی تێبکات ناتەواوییە لەرێزو دەستەڵاتو شکۆمەندی.

*کلکی ئەسپ شوێنکەوتوانی پیاوە، ئەگەر کۆمەڵێك کلکی زۆری هەبوو شوێنکەوتەی زۆردەبێت، ئەگەر هەر کلکێکی هەبوو یان کلکی براوبوو شوێنکەوتوانی کەم دەبن.

*هەموو ئەندامێکی ئەسپ بەشو پارچەیەکی دەستەڵاتدارە.

* ئەگەر بینی بەسواری ئەسپێکەوەیەو یاخیو بەلەسەبوە لێی روودەکاتە سەرپێچی یاخود بەلاو نەهامەتی بەئەندازەی سەرپێچیو یا جموجووڵی ئەسپەکە دێت بەسەریا.

* دەگونجێت لێکدانەوەی ئەسپ بەئارەزووبێت، بۆنموونە دەگوترێت: فلانەکەس شوێن ئارەزووی کەوتو ملی شکاند.

* ئەگەر ئەسپەکە رامنەدەبوو یا شێتبوو خراپترە.

* سواربوونی ئەسپ هیچ خێرێکی تێدا نییە مەگەر لەشوێنی ئاژەڵدابێت، هەروەها خێری تێدا نییە لەلای دیوار یا لەسەربان یاخود لەشوێنی بەندایەتی مەگەر ئەسپەکە باڵداربێتو بفڕێ لەنێوان ئاسمانو زەویدا ئەوەش رێزداری ئاینو دنیایە لەگەڵ هاتنەپێشی سەفەر.

* ئەسپی بەڵەك بەڵەك ناوبانگە، ئەسپی رەشیش ماڵو دەوڵەمەندیو شکۆمەندییە لەسەفەردا.

* ئەسپی خەنەیی بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە، لەروویەکیترەوە خەنەیی سەرکەوتنە چونکە ئەسپی فریشتەکان خەنەیی بوە.

* دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم بەسواری ئەسپێکەوەم قاچەکانی ئاسنە، ئەویش پێی وت: چاوەڕێ مردنبە.

* هەروەها دەگێڕنەوە(عەلی) کوڕی (عیسی)ی وەزیر بەرلەوەی کاروباری وەزارەت وەربگیرێ لەخەودا بینی وەك ئەوەی لەژێر سێبەری خۆردابێت لەوەرزی زستاندا، سواری ئەسپەکەبوو بەجلوبەرگێکی جوانەوەو پاشان ددانەکانی کەوتنو لەترسو بیمداو لەناکاو بەترسەوە لەخەوهەستا، خەوەکەی بۆ راڤەکارێکی خەوگێڕایەوە ئەویش پێی وت: ئەسپ شکۆمەندیو دەوڵەتدارییە، جلوبەرگی جوانیش پلەوپایەو دەستەڵاتە، لەبەر تیشکی خۆردا وەستان وەزارەتی پادشایە یاخود دەرگاداریو بەخزمەتە لەئامێزی ئەواندا، کەوتنی هەموو ددانەکانیش تەمەندرێژییە.

* هەروەها دەڵێن: ئەگەر ئەسپێك ببینێ بەمردوویی لەماڵەکەی خۆیدا یا بەدەستیەوە تیاچوونی ئەو کەسەیە کەخەونەکەی پێوە بینیوە، ئەوەی سواری ئەسپێکی پەلسپی بێت بەسەرجەم پێداویستیەکانیەوەو خۆشی جلوبەرگی سوارچاکانی پۆشیبێت، دەستەڵاتو مەزنیو باسی باشو خۆشنوودیو دڵنیابوون لەدوژمنان بەدەستدەهێنێت.

* ئەسپی رەشسوور بەهێزترە لەکوشتارو جەنگدا.

* ئەسپی سەمەند رێزداریو نەخۆشییە، ئەوەی سواری ئەسپێك ببێتو غاری پێبکات هەتا عارەق

دەکاتەوە ئارەزوویەکەو شوێنی دەکەوێتو سەرپێچییەکی لەپێناوی ئارەقکردنەوەدا دەکات.

*ئەسپ بۆ یەکێك لەدوورەوە بیبینێ مژدەو خێرە بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر(ﷺ): "خێر لەنێوچەوانی ئەسپدایە هەتا رۆژی قیامەت".

*ئەگەر بینی ئەسپێك لێدەخورێت داوای خزمەت لەپیاوێکی رێزدار دەکات.

*ئەگەر سواری ئەسپێکی دووبالّبوو مولّكو دەستەلاتێکی مەزن بەدەست دەهێنێت، ئەگەر شایستە بێت وەگەرنا دەگات بەویستو خوازی.

*ئەسپی شێت پیاوێکی شێتەو گالتەدەکا بەکاروبار.

*بازدانی ئەسپ بەخێرایی بەدەستهێنانی هیواو ئاواتەو وەستانی زیادبوونی خێرو چاکەیە، هەروەها چوستو چالاکی رێکبوونی کاروبارەکانیەتی.

*هەروەها دەلّێن: بەریەرەکانی ئەسپەکەی لەگەڵی یاخیبوونی خزمەتکارەکەیەتی لەبەرانبەری ئەگەر خاوەن دەستەلات بازرگان بێت چوونە دەرەوەیە، بەلاّم غارغارێنی ئەسپ لەنێوان مالاّندا بارانو لافاوە ، ئەگەر ئەسپەکە رووتو بێ زین بێت یا سوارەیەکی بەسەرەوە نەبێت.

*ئەگەر رەوگە ئەسپێکی بینی هەموویان زینیان بەسەر پشتەوەبوو بەلاّم هیچ سوارەیەکیان بەسەرەوە نەبوو ژنانن لەپرسەو شاییدا کۆدەبنەوە.

*ئەگەر بوو بەخاوەن رەوگە ئەسپێك یاخود هەستا بەلەوەڕاندنیان دەستەلاتو فەرمانڕەوایی بەسەر نەتەوەیەکدا بۆ دروستدەبێت یاخود لەشوێنو جێگەی خۆیدەبێت بەفەرمانڕەواو دەستەلاتدار.

*ئەگەر سواری ئەسپێکبوو بەزینەوە رێزو شکۆمەندیو دەستەلات بەدەستدەهێنێت ، چونکە لەهۆکاری سواری پادشاکانە. دەگونجێت ژنێك مارە بکات یاخود خزمەتکارێ بەکرێ بگرێت.

*ئەگەر بەبێ لغاو سواریبوو بێ خێرە لەهەموو روویەکەوە، چونکە لغاو بەلّگەیە لەسەر خواناسیو پارێزکاریو تواناداری.

*ئەگەر ئەسپێکی نادیاری بینی لەمالّی خۆیدا ئەگەر زینی پێوەبوو ژنێك بێ مارەبڕین دێتە لای یاخود سەردانو میوانداریدەکات ، ئەگەر ئەسپەکە رووتبوو پیاوێك دەبێت بەخزمو زاوای.

(ئیبن سیرین) دەلّێت: ئەگەر ئەسپێك بکا بەلای کەسێکیتردا بەهۆی ئەسپ یا شەهادەوە ستەمی لێدەکات.

*سواربوونی ئەسپ بەلّگەیە لەسەر زالّبوونو دەرکەوتنو دەگونجێت بەلّگەبێت لەسەر ئەوەی مرۆڤ بەسەریەوە دەنیشێتەوە ، ئەگەر ئەسپەکە هێمنبوو حالّو باری

باشدەبێت ، ئەگەر شێتبوو بەلەسە دەبێتو یاریدەکات.

* دەگونجێت ئەوەی دەنیشێتەوە بەسەریەوە بەڵگەبێت لەسەر رۆژگارو سەردەم یان شەوو رۆژ ، بەلاَم جوانوی نێرومێ کورِوکچە ، ئەگەر سواری جوانوویەك بوو بەلاَم هیچ زینێکی بەسەر پشتەوە نەبوو کچێکی تازەپێگەیشتوو مارە دەبرِێت.

* کلکی ئەسپ وەچەی پیاوو شوێنکەوتوانییەتی.

* ئەگەر دوو ئەسپی بینی دەفرِن بەئاسماندا لەو شوێنەدا فتنەو شەرِ دەکەوێتەوە.

* بینینی ئەسپی ئاویی بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی درۆزنو کارێك کەوا تەواوناکرێ.

* بینینی ئەسپ بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی رزقو رۆزیو سەرکەوتنی بەسەر دوژمنەکانیدا.

* ئەگەر بینی سواری ئەسپێکبوەو شایستەی سوارچاکی بێت شکۆمەندیو پلەوپایەو ماڵو دارایی دەستدەکەوێت، دەگونجێت راستگۆبێت لەگەڵ پیاوێکی چاکەکاردا یاخود سەفەریکات چونکە سەفەر لە(فرس)ەوە وەرگیراوە.

* ئەگەر جوانوبوو خوداوەند کورِێکی جوانکیلەی پێدەبەخشێت.

* ئەگەر بارگیربوو بەمامناوەندی دەژی، نەهەژارو نەدەوڵەمەند.

* ئەگەر لانەو ژوورێکی هەبوو هاوسەرگیری دەبەستێت ، ئەگەر بێهاوسەربێت لەگەڵ ژنێکی خاوەن سامانو بەرەچەڵەك یەکدەگرێ.

* ئەسپی رەسەن باشترە لەنارەسەن.

* دەگونجێت ئەسپ بەڵگەبێت لەسەر ماڵو لانەی خۆشو جوانو سەرنج راکێش.

* ئەسپی رەشبۆر شکۆمەندیو سەرکەوتنە بەسەر دوژمناندا چونکە لەئەسپی فریشتەکانن.

*ئەسپی رەش: غەمو پەژارەیە.

*ئەسپی خەنەیی: پەل سپی زانیاریو ئاینو خواناسیە.

* ئەگەر سواری ئەسپێکی رەشسووربوو دەگونجێت مەیو بادەبخواتەوە چونکە لەناوەکانیەتی.

* ئەگەر سواری ولاخی کەسێکی تربێت دەگات بەپلەوپایەی ئەو یاخود پەیرەوی رێبازی ئەوکەسەدەکات.

* ئاژەڵی رەش مەزنییە، خەنەیش جەنگو هەرایە.

* ئەگەر ئەسپێکی زینکراوی بینی بەلاَم هیچ سوارەیەکی بەسەرەوە نەبینی ژنانن بۆ شایی یاخود پرسە کۆبوونەتەوە.

* ئەگەر ئەسپی بینی لەخەودا لای براکانی پەسەند دەبێت.

* ئەسپ لەخەودا پیاو یا کورِ یاخود سوارچاکە یان بازرگانە یا پیشەوەری

خاوەن فیراسەیە لە کارو بازرگانیەکەیدا.
*ئەسپ شەریکە.
*ئەگەر بینی ئەسپێك لەبەردەستیا دەمرێت لەماڵەکەیدا بەهیلاکدەچێت.
*ئەگەر زاڵبوو توانای شکا بەسەریا ناوبانگێکی باشی دەبێت ، ئەگەر بازرگانبوو خاوەن ئەمانەتەو لەژیانیدا دڵنیاو خۆشنود دەبێت، ئەگەر ئەسپەکە رەشبوو پلەوپایەو شکۆمەندی ئێجگار بەرزو بالا دەبێتو لەدەستەلاتیشدا بەتواناو دەبێ.
*ئەگەر ئەسپەکە خەنەیبوو نەخۆشیو رێزدارییە چونکە ئەسپی فریشتەکان خەنەیین، هەروەها (ئیبن سیرین) رقی لەئەسپی خەنەیی دەبووەوە لەخەوداو دەیگووت: جەنگو شەڕە ، ئەگەر ئەسپەکە بەڵەك بەڵەکبوو ئەوە ئارەزووە لەگەڵ دەستەلاتدارییەك کەوا خوازیارو ئاواتەخوازیەتی، ئەگەر سواریبوو غارغارێنی پێوەکردو ئارەقی دەردا ئەوە حەزو ئارەزوویەکە هەمیشە شوێنی دەکەوێتو لێی جیانابێتەوەو ماڵو سامانەکەی بەهەدەر دەچێت تێداو سەرپێچی ئەنجام دەدات.
*ئارەقیش ماندوبوونە لەگەڵ سەرپێچیدا، ئەو سوارچاکەشی لەخەودا دەبینرێو ژنەکەی دووگیانە کوڕێکی دەبێت.
*ئەسپ بۆ یەکێك ببینێ لەدوورەوە مژدەو شکۆمەندیو خێروچاکەیە.

*ئەگەر بینی لەسەر ئەسپێك دێتە خوارەوە ئەگەر دەستەلاتداربوو کارو رەفتارێك ئەنجام دەدات لێی پاشگەز دەبێتەوە، ئەگەر دابەزیو بەجێیهێشتو خۆی بەکارێکەوە سەرقاڵکرد لەسەرکار لابردنیەتی لەگەڵ سەرشۆڕیو ملکەچکردنی.
*ماین ژنێکی رێزداری داوێنپاکە، ئەسپی شێتیش پیاوێکی شێتە، ئەسپی قیرسیچمەش خاوخلیچکە لەکاروبارەکانیدا.
*سپێتی پێشەسەری ئەسپو کلکی خاوەن شکۆیانی دەستەلاتدارە ، ئەگەر درایە پاڵ کوڕەکەی ئازاترینیانە، خاوییو گێژیو کەمی جموجوولیشی جەنگو شەڕە بۆ دەستەلاتدارو دەستکورتییەو زاڵبوونی دوژمنە بەسەریا.
*زۆربوونی مووی کلکی ئەسپ زیادبوونی وەچەی نێرینەیە.
*ئەگەر بینی کلکی لەبنابڕاوە کوڕو شوێنکەوتەکانی پێش خۆی دەمرن.
*ئەگەر ئەسپەکەی سەرکەشیکرد لەگەڵیو خۆشی دەستەلاتداربوو سەرکردەیەکی رێزدار لێی یاخی دەبێت یامنداڵێکی بەخشندە، ئەگەر بازرگانبوو جیابوونەوەی شەریکەکەیەتی لێی بازدانی ئەسپیش رێكو پێکی راوبۆچوونە، خۆهەڵدانیشی بەدەستهێنانی پێداویستەکانە بەشێوەیەکی خێرا.

*ئەگەر بینی ئەسپێك لێدەخورێت داوای خزمەتگوزاری دەكات لەپیاوێكی رێزداری شكۆمەند.
*هیچ زیانێكی تێدانییە ئەگەر مەردوم سواری ئەسپێك بێت لەشوێنی خۆیدا نەبێت.
*هەروەها دەڵێن: ئەسپ ناوبانگو دەستەلأتدارێكی بەناوبانگە.
*ئەگەر بینی سواری ئەسپێكی بەڵەك بەكەڵك بووەو لەبێداریدا هاوسەرینەبوو هاوسەردەگرێ، ئەگەر لەگۆشتی ئەسپەكە بخواتو خەوبینەر دەستەلأتداربێ زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەكانیدا، ئەگەر بازرگان بێت سوودو قازانج بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر بینی ئەسپێك دەكوژێت نازو نیعمەتو ماڵو هێزو شكۆمەندیێ بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر بینی سوارچاكان دەفڕن بەئاسماندا نزیكە جەنگو هەرا بەرپابێت لەنێوان پادشایانو فیتنەو ئاشوب لەو شارەدا بكەوێتەوە.
*خواردنی گۆشتی ئەسپ بەدەستهێنانی ناوبانگێكی باشە لەنێو خەڵكیدا.
*ئەگەر سواری ئەسپێك ببێت قاچەكانی لەئاسن بێت دەمرێت.
*ئەگەر بینی ریێ لەئەسپێك دەگریێ بەهۆی دنیاوە سەرقاڵدەبێت لەنوێژكردنو خوازیاری تەوبەو پەشیمانییە.

*ئەگەر بینی لەسەر ئەسپەكەی دێتەخوارەوەو سواری ئەسپێكیتر دەبێت لەحاڵو بارێكەوە دەچێت بۆ یەكێكی دی، مابەینی نێوان هەردوو حاڵو بارەكەش بەئەندازەی نێوان هەردوو ئەسپەكەیە.
*ئەگەر بینی لەسەر ئەسپەكە دێتەخوارەوە لەسەركارەكەی لادەبریێو یەكێكیتر دادەنریێ.
*ئەوەی خۆی بەسەر ئەسپێكەوە ببینیێو بەدڵی بێت دەجەنگی لەپێناوی خودایا.
*ئەگەر بینی بەسواری ئەسپێكەوەیەو رمێكی بەدەستەوەیەو تەنگ بەخەڵكی هەڵدەچنیێ پیاوێكە داوا لەخەڵكی دەكاتو زۆریان لێدەكات لەداواكردندا، ئەگەر چەكی پێبوو دوژمنانی دەستیان پێناگات.
*ئەگەر بینی ئەسپەكەی نوقمدەكات یان یەكێكی دی سەریدەبڕێت یاخود بەر لافاو بكەوێتو بیبات نەخۆشێك دەمرێت.
*ئەگەر ئەسپەكەی كوێرێكی لاوازبوو تێكەڵبوونی كارو بارەكانیەتی لەبژێویدا.
*ئەگەر بەسواری ئەسپێكی مردووەوەبوو غەمو پەژارە رووی تێدەكات بەلأم قوتار دەبێت لێی.
*ئەگەر بینی ئەسپێك دەدوێت لەگەڵی سەرسام دەبێت لەحاڵوباری خۆی.

*ئەگەر بینی ئەسپێك دەكڕێ یا گوێدرێـژێك یـاخود رەخنـەی لـێگیرا لەكاتێكدا پـارەو سامانی لەدەستیدا دەهێنـاو دەبـرد خێرێكـی دەسـتگیردەبێت بـەهۆی قـسەو گوتەیەكەوە كەدەیكات چونكە پـارەو پوول قسەیە.

*ئەگەر بینی پـارەو بەهاكـەی دەداتو دیارینـەكردو هەڵینەسـوڕاند خێرێكـی دەسـتگیردەبێتو سوپاسـگوزاری خۆیدەردەبڕێ.

*ئەگەر بینی ئەسپەكەی دەفرۆشێ واز لەكاروپیـشەكەی دەهێنێـت بەویـستی خۆی.

*ئەگەر بینی ئەسپەكەی سـەردەبڕێو نایـەوێت گۆشـتەكەی بخـوات بـژێویو ژیانی تێكدەدات بەهۆی فەرمانڕەواوە.

*ئەگەر بینی ئەسپێكی نادیار دێتە نێو زەویـەك یالانـەو ماڵێـكو خاوەنەكـەی ناناسـێت ئـەوە پیـاوێكی رێـزدار روو لەوشوێنە دەكات.

*ئەگەر بینی ئەسپێكی نادیار لەشوێنی خۆی بەدەر دەكەوێت پیـاوێكی گـەورە كۆچدەكات یان دەمرێت.

*ئەگـەر رەوگـە ئەسـپێكی ببینـێ غارغارێندەكـەن لـەلای ماڵێـكو دەچـنە نێـو زەویو شـوێنێك بـارانو لافـاو روو لەو شوێنەدەكات.

*ئەگـەر بینـی لەگـەڵ پیـاوێكی نەناسـراودا بەسـواری ئەسـپێكەوەن دەگات بـەو پیـاوەو داوایـەكی دنیـاییو ئـاینی لێـدەكات، یـاخود ئـەو پیـاوە دەبێـت بەشـوێنكەوتە یـان شـەریكو جێنشین لەدوای خۆی، ئەگەر پیـاوێكی نادیاربوو دوژمنە بەهەر حاڵێك بێت.

*ئەگـەر بینـی ئـاژەڵێكی نادیـار پێـی پێـدادەنێت یـاخود بەسـەریا دەڕوات لەدەستەلاتو پلەوپایـەو كاروپیـشەی خـۆی لادەبرێتو ملكەچـیو رسـواییو دەرەنجـامی خـراپ رووی تێـدەكاتو خەڵكی بەزوبانیان برینداریدەكەن.

*ئەگـەر سـواری ماینێـك ببێـت یـاخود ببێـت بـەخاوەنیو رەبـەن بێـت ژنێكـی رێـزدارو داوێنپـاكی پـیرۆز دەبێـت بەهاوسـەری ، ئەگـەر جوانـوی هـەبێت كوڕێكی لێی دەبێـت ، ئەگـەر پیاوەكـە هاوسـەرداربوو یـاخود یـەكێكبوو چـاوەڕێی هاوسـەرگیری نـەدەكرد روو لەگونـدو شـوێنو جێگەیـەكی وێرانـەدەكاتو سـوودو قـازانجی لـەو شوێنو جێگەیە پێدەگات.

*ئەگـەر ببینێـت ماینەكـەی دەمرێـت یـاخود دەدزرێـت یـا ونـدەبێت گرێـی بژێوی دەكرێتەوە.

*ئەگـەر بینـی ئەسـپەكەی نركـە نركـدەكات رزقو رۆزی دەبوژێتـەوەو ماڵو دارایی زیاد دەكات.

*ئەگـەر بینـی شـیری مـاین دەخـوات ئـەوە دەسـتەلاتدار نزیكـی دەخاتـەوە لەخۆیو خێری لێدەستگیر دەبێت.

*ئەگـەر ببینـێ مـووی ئەسـپەكەی زیادیكردووە ماڵو منداڵی زیاد دەكات،

ئەگەر دەستەلاتداربوو سوپاکەی زیاد دەکات.
*ئەسپی خەسێنراو بەلگەیە لەسەر خزمەتکارو بەردەست.
*ئاژەڵی بێ ڕێوشوێن ژنێکی زیناکارە چونکە چۆنی بوێت ئاوا دەچێت بەڕێوە.
*ئەسپی بارهەلگر نزیکبوونەوەی چارەنووس و ئەجەلی ئەوەیە کەلەخەودا سواریبوە، دەگونجێت لاوازی ئەسپ بەلگەبێت لەسەر لاوازی شکۆو پلەوپایە.

**ئەسپی باڵداری پێغەمبەران(ﷺ):** ئەوەی لەخەودا بیبینێ دەگات بەپلەوپایەیەکی بەرزو بڵند، بەشکۆمەندی سەفەر دەکات و بەهەمان شێوەش دەگەڕێتەوە یاخود بەشەهیدی دەمرێت و گیانی دەسپێرێ.

**ئەسپی شەترەنج:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەلگەیە لەسەر بەلێننامەی پارەو دارایی.
*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر دەستبڕین و ڕوحکێشانی مردوو.

**ئەسپێ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر لەجل وبەرگی نوێدابوو زیادەی ئاینداریيە، ئەگەر لەسەر زەویبوو گەل و کۆمەلێکی لاوازە، ئەگەر لەدەوروبەریدابوو هاوەلایەتی نەتەوەیەکی لاوازدەکات بەلام زیانی پێناگەیەنن.

*گەزتنی ئەسپێ بریندارییە لەدوژمنێکی لاوازەوە.
*ئەگەر بینی ئەسپێیەکی گەورە لەجەستەی هاتەدەرەوەو لێی دوورکەوتەوە بەلگەیە لەسەر کەمبوونەوەی وادەی ژیانی.
*هەروەها دەڵێن: ئەسپێ مندال و چاکەکردنە لەگەڵیان.
*هەروەها دەڵێن: بەلگەیە لەسەر غەم و پەژارەو گرتن و زیادبوونی نەخۆشییە ، خواردنیشی باسکردنەو ئەسپێی گەورە غەشم و قین و سزایە.
*ئەگەر ئەسپێی دۆزی لەجلەکانی درۆیەکی گەورەی لەگەڵدا دەکرێ.
*ئەسپێی نێو گەنم سزاو خەشم وقینە چونکە لەبەلگەو نیشانەکانی (موسا)بوو (سەلامی خوای لێبێت).
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دنیایە لەگەڵ ماڵ و دارایی.
*ئەگەر ئەسپێکان لەکراسی نوێدابوو نوێکردنەوەی دەستەلاتە بۆ یەکێك فەرمانڕەوابێت یاخود ماڵ و سامانێکە خوازیاری زیادبوونییەتی.
*ئەگەر بینی ئەسپێیەکی پانکردەوە چاکدەبێت لەگەڵ منداڵەکانی.
*ئەگەر بینی ئەسپێیەکی زیندووی فرێدا کارێکی واژووی سوننە جێبەجێدەکات چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری لێکردوە.
*ئەگەر بینی ئەسپێیەکی خوارد غەیبەتی ئەوانە دەکات

کەلەلێکدانەوەی ئەسپێدا باسمانکردن و ئەسپێی زۆریش سزایە.

*ئەسپێ منداڵ و کۆمەڵێکی سووک و دووزمانن کەوا لەنێوان خزم وکەسوکارو برایاندا دووزوبانی دەکەن.

*ئەگەر ئەسپێیەکی زۆری لەجل و لەشولاریدا بینی خێرو نازو نیعمەت و فەرووپیت و قوتاربوون لەسەرجەم غەم و پەژارەکان بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر ئەسپێی بینی پانیدەکردەوە بەڵگەیە لەسەر قوتاربوونی لەهەموو غەم و پەژارەیەك.

*ئەگەر ژمارەیەکی زۆر ئەسپێی بینی بەڵگەیە لەسەر نەخۆشییەکی درێژخایان و زەرەرو هەژاری و کوشتن و دەروولێکردنەوەی بەلاّدارو قوتاربوون لەناڕەحەتی، ئەگەر لەخەو بەئاگاهات و وایدەزانی ئەسپێکان شوێنی دەکەون قوتارنابێ.

*ئەگەر ئەسپێیی لەجلەکانیکردەوە درۆیەکی گەورەی بەدەمەوەکراوە.

*ئەگەر ئەسپێی پێدا نووسا گەلونەتەوەیەکی لاواز قسەی پێدەڵێن.

*ئەگەر ئەسپێ خوروخورووی بۆ دروستکرد داوای قەرزی لێدەکەنەوەو خواردنی ئەسپێش بەڵگەیە لەسەر زاڵبوون بەسەر دوژمناندا.

**ئەستێرەگەر( ئەستێرەناس ):** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر ئەوانەی ئاگایان لەحاڵ و باریانە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ئاگاداری و دەرکەوتنی نهێنی و قسەی زیادەو گواستنەوەی گوتەی ڕاست و ناڕاست.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر غەم وپەژارە، ئەوەی لەحاڵێکی ئاوادابێت بەڵگەیەلەسەر دەروولێکردنەوە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر:

+هاوسەرگیری ڕەبەن.

+جیابوونەوەی دوو هاوسەر.

+مردنی نەخۆش.

+سەفەر بۆ کەسێکی نیشتەجێ.

+قوتاربوونی دووگیان.

+مژدەو ئاگاداری.

+شوێنکەوتنی سوننەت.

+زانیاری و کرداری بەجێ.

**ئەستێڵ( گۆم ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ڕەحم کەشوێنی مەنی و ئاوە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵ و دارایی و کیسەو گەنجینەو سندووق و جلەشۆر.

*ئەستێڵ بەڵگەیە لەسەر هەرکەسێك ئاگاداری نهێنی بێت وەك شەریك و کوڕ.

*ئەگەر ئەستێڵی زەیت ئاوی تێکرا بەڵگەیە لەسەر وەستان و خراپبوونی، هەروەها ئەگەر لەئەستێڵی ئاویش

زەیتی بینی بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی خاوەنەکەی.

*ئەستێڵی مزگەوت بەڵگەیە لەسەر پێشەواکەی یان ئەوەی تەماشای کاروبارەکانی دەکات.

*ئەگەر ئەستێڵێکی بینی لەشوێنێك کەوا نەدەگونجا بۆی بەڵگەیە لەسەر جنۆکە کەوا پەرپوەتەسەر خانەوادەکەی یاخود ئەو شوێنەی ئەوانی تیا مۆڵدەبن.

*ئەگەر بیرێکبوو بەئەستێڵ بەڵگەیە لەسەر میانەڕەوی حاڵی خانەوادەی، ئەگەر ئاوی بیرەکە سوێربوو لەکاتی بێداریداو لەخەودا چەوریو رۆن کەوتە نێویەوە یاخود هەنگوینو شیر بەڵگەیە لەسەر دووگیانی هاوسەرەکەی یان زیادەیەکی بێشومار، مەگەر خانەوادەکەی لەخەودا تینوبن ئەوجا بەڵگەیە لەسەر عەمباری ئاوو خانەوادەکەی لەوانەن کەدنیا هەڵدەبژێرن بەسەر قیامەتدا یان زانیارییان هەیە بەڵام کرداری پێناکەن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەبوونی بارانو بەخشینی ماڵ بەهۆیەوە.

*دەگونجێت ئەستێڵ بەڵگەبێت لەسەر ناخێکی پارێزراو.

*هەروەها ئەستێڵ بەڵگەیە لەسەر ئاسانکردنی کاروبارو شکۆمەندیو پلەوپایەی بەرز مەگەر کەسێکی دەموچاو هەڵبەستراوی تیابێت ئەوجا بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی لەترسوبیم.

(نابلسی) دەڵێت: چوونە نێوی لەخەودا چوونە نێو ناپاکیو پلانە.

**ئەشکەوت**:(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دڵنیاییە بۆ کەسێك بترسێ، ئەگەر بینی هەڵدێت لەدوژمنی هەتا خۆیکرد بەئەشکەوتێکدا ئەوە دڵنیادەبێت لەدوژمنی بەپێی ئایەتی: ﴿ ثَانِيَ اثْنَيْنِ اِذْهُمَا فِي الغَارِ﴾ (التوبة: ٤).

*ئەشکەوت ژنێکە بۆیەکێك کەبچێتە نێوی.

*زاراوەی (غار) کەوا بەمانای ئەشکەوتدێت لە(غیرە)وە هاتووە.

*دەگونجێت ئەشکەوت بەڵگەبێت لەسەر هاوڕێو بەخت بەپێی چیرۆکی (ئەبوبەکری صدیق) ـ ڕەزای خوای لێبێت ..

*ئەگەر بینی چوە نێو ئەشکەوتی چیایەك پلاندەگێڕێ لەدژی فەرمانڕەوایەك یاخود پیاوێکی تۆکمەو بەهێز.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەرئەوەی مرۆڤ رووی تێدەکات وەك پێشەواو باوكو مامۆستاو ژنو پیشە.

*بۆ کەسێکی بێکار بەڵگەیە لەسەر خزمەتو نزیکبوونەوە لەفەرمانڕەوایانو خۆ قوتارکردن لەناڕەحەتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شاردنەوەی کاروبار.

*ئەگەر خەوبینەر نەخۆشبوو یاخود زیندانیکرابوو لەهەمووی قوتاردەبێ،

دەگونجێت تەمەندرێژ ببیّو خێری زۆربیّ ئەمەش بەچواندنی لەسەر چیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوت(أصحاب الكهف).

**ئەکاسیا:** (نابلسی)دەڵێت: جۆرەدارێکەو بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رەزیلیو شەڕو ئەنجامدانی کردارو رەفتاری دۆزەخیەکان.

**ئەڵقە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ئاینی ئیسلامە ئەگەر بینی دەستی بەئەڵقەیەکەوە گرتووە دەستی بەئاینی ئیسلامەوە گرتووە.

*ئەڵقە بەدەرگاوە بەڵگەیە لەسەر دەرگاوان یاخود سەگی پاسەوانی ، ئەگەر ئەڵقەکە لەزێڕبوو یا لەزیوو بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندیو بەرزیو موڵك، ئەڵقەی دەرگاش وەك دەرگاوانو پێغەمبەر وایە، ئەوەی دوو ئەڵقە بەدەرگایەکەوە ببینیّ قەرزی دووکەسی لایە.

*ئەگەر بینی ئەڵقەی دەرگاکەی دەرهێنا سەردەکات بەبیدعەو کارێکی داهێنراودا.

**ئەڵقەرێز:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پارەیە وەك سەد هەزار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەرشۆڕیو، هەڵکەندنی لەشوێنی خۆیدا ملکەچییە.

*نوێکردنەوەی یان شکاندنی پارێزگاریو پاراستنی ماڵودارایییە یاخود زانیاری.

*دەگونجێت ئەڵقە بەڵگەبێت لەسەر لەبەرکردنی شەرواڵ.

**ئەڵلاهوئەکبەرکردن:** (نابلسی)دەڵێت: ئەڵلاهوئەکبەرکردن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هەمیشە تەوبەکردن ، ئەگەر بینی لەخەودا دەڵێت: (الله اكبر) ئەوا زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیداو چاوی گەشدەبێتو خۆشیو شادی رووی تێدەکات یان رێزو شکۆمەندییەك دێت بەسەریا.

**ئەموستیلە( ئەڵقە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەموستیلەو ئەڵقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەیەتیو توانای هەیە بەسەریدا.

*ئەگەر ئەڵقەیەك ببەخشیّ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەیەتیو توانای هەیە بەسەریا.

*ئەگەر ئەموستیلەیەك ببەخشیّ یاخود بیکڕیّ یان پێی ببەخشریّ فەرمانڕەواییو دەستەڵات بەدەستدەهێنێت ئەگەر شایستەبێت، چونکە موڵكو دەستەڵاتی (سولەیمان) لەئەموستیلەکەیدابوە، هەروەها پادشایان مۆرەکەیان لەئەموستیلەو ئەڵقەیەکدایە.

*دەگونجێت لانەو ماڵێك بێت تێدا نیشتەجیّ بێت یاخود ببیّ بەخاوەنیو، نقێمەکەشی دەرگاکەی بێت.

*دەگونجێت ژنێك بێتو بیکات بەهاوسەری خۆی پاشان ببێت بەبەرپرسیارو گەورەی.

*دەگونجێت بردنەوەی ئەموستیلە لەلایەن خوداوەندەوە بۆ خواناس‌و ئایندار دڵنیایی بێت لەخراپەو زیان ، بردنی ئەڵقەش لەپێغەمبەر (ﷺ) یاخود زانایەك مژدەبێت بەبەدەستهێنانی زانیاری ، سەرجەم ئەوانەی باسی لێکرا سەبارەت بەئەڵقەی زیوە، بەڵام ئەگەر زێڕبوو هیچ خێرێکی تێدا نییە، هەروەها ئەگەر ئاسن یا مسبوو خێری تێدا نییە چونکە خشڵی دۆزەخیەکانە.

*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر باوك‌و ژن یاخود کڕینی ماڵ‌و خانوو یان بەدەستهێنانی دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی ، ئەگەر زێڕبوو بۆ پیاو ملکەچی‌و سەرشۆڕییە.

*هەروەها گوتراوە: ئەگەر بینی ئەموستیلەیەکی ئاسنی لەپەنجەکردوە بەڵگەیە لەسەر خێرێك دوای ماندوبوون بەدەستی دەهێنێت، ئەگەر لەزێڕبوو نقێمی تێدابوو باپیرەیە.

*ئەڵقەو ئەموستیلەی بەتاڵیش هەمیشە خێرە، ئەوەشی لەناوەکەیدا نقێم یان شتێکی تێدایە بەڵگەیە لەسەر فێڵ‌و تیرۆر چونکە شتێکی نهێنی‌و پەنهانی لەخۆگرتوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تکاکردن بۆ شتێکی مەزن‌و بەسوود.

*ئەڵقەو ئەموستیلەی دروستکراو لەشاخ یان کەڵبەی فیل بۆ ژنان باشە.

*هەروەها دەڵێن: ئەڵقە دەستەڵاتێکی گەورەیە، ئەڵقەو بازنەکەی بنەڕەتی موڵك‌و دەسەڵاتە‌و نقێمەکەشی هەیبەت‌و مۆرەکەشی ڕۆیشتنی دەسەڵات‌و فەرمانە لەگەڵ ماڵ‌و دەستەڵات.

*ئەموستیلە فەرمان‌و ڕێگرییە ، نەخش‌و نیگاری نێویشی ویست‌و ئومێدە.

*ئەگەر بینی موڵك‌و دەستەڵات بەمۆری ئەو مۆر کراوە دەستەڵاتێکی کتوپڕو خێرا بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی ئەڵقەو ئەموستیلەیەکی زیوی لەپەنجەکردوە بەهەر شێوەیەك ویستی وابوو دەستەڵات‌و فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر ئەڵقەو ئەموستیلەیەکی دۆزییەوە ماڵی لەلایەن عەجەمییەکەوە دەستدەکەوێت یاخود کوڕێکی دەبێت یا هاوسەر دەگرێ.

*ئەگەر نقێمی ئەموستیلەکەی جووڵایەوە دەستەڵات‌و فەرمانڕەواییەکەی دەڕەوێتەوەو تیادەچێت.

*ئەگەر نقێمەکەی کەوت کوڕەکەی دەمرێت یان هەندێك لەماڵ‌و دارایی تیادەچێت.

*ئەگەر ئەموستیلەکەی لەدەستداکەندو فەرمانڕەواشبوو لەسەر کار لادەبرێ ، یاخود موڵك‌و دەستەڵاتەکەی بەسەر دەچێت یا ژنەکەی تەڵاقدەدات، بۆ ژنیش مردنی

مێردەکەیەتی یان نزیکترین کەس لێوەی.
* هەروەها دەڵێن: ئەگەر مرۆڤ ئەموستیلەی لەپەنجەکرد شتێکی بۆ نوێدەبێتەوە کەدەدرێتە پاڵ ئەموستیلەکە.
* ئەگەر بینی ئەموستیلەکەی شکاوەو بەتەنیا نقێمەکەی ماوەتەوە ناوبانگی باش‌و شکۆیەتییە.
* ئەموستیلەی زێڕ بیدعەو کاری ناڕەوایە لەئایندا‌و خیانەت‌و ناپاکییە لەموڵك‌و ژێردەستەکان.
* ئەموستیلەی ئاسن فەرمانڕەواو بەرپرسێکی ئازایە یاخود چاودێرو ئاگادارە بەڵام هێواش‌و کەم باسە.
* ئەموستیلەی قورقوشم دەستەڵاتدارێکی لاوازو سستە.
* ئەموستیلەی دوو نقێم دەستەڵاتێکی دیارو شاراوەیە ، ئەگەر ئەو ئەموستیلەیە درایە پاڵ بازرگان سوودو قازانجە، بەڵام ئەگەر درایە پاڵ زانیاری چارەسەری خەڵکی دیندارە بۆ دنیاپەرستان.
* تەنگی ئەموستیلەو ئەڵقە بەڵگەیە لەسەر پشوودان‌و دەروولێکردنەوە.
* ئەگەر ئەموستیلەیەك بەئەمانەت وەربگرێ دەبێت بەخاوەنی شتێك کەوا نامێنێتەوە.
* ئەگەر بوو بەخاوەنی شتێك هیچکات نەبوبوو بەخاوەنی وەك خانوو و ئوتومبیل‌و ئاژەڵ یاخود ژن‌و کوڕو خزمەتکار.
* ئەگەر چەندین ئەموستیلەی بینی لەبازاڕ دەفرۆشرا فرۆشتنی موڵکی خەڵکی سەرکردەو گەورەیە.
* ئەگەر بینی ئاسمان ئەموستیلە دەبارێنێ لەوماڵەدا منداڵی نێرینە زۆر لەدایکدەبێت.
* ئەموستیلە بۆ (عەرەب) ژنە.
* ئەموستیلەی زێڕ ژنێکە ماڵ‌و دارایی نەمابێ.
* ئەگەر ئەموستیلەیەك بکاتە پەنجەتووتەی ، پاشان دایبکەنێت یاخود بیکاتە پەنجەیەکی تری دەبێت بەدەویت بۆ ژنەکەی‌و هانیدەدات بۆ خراپە.
* ئەگەر ئەو ئەموستیلەیەی دەیکردە پەنجە تووتەی جارێك لەپەنجەتووتەو جارێکیش لەپەنجەکانی تریدابێت بێنەوەی بیگۆڕێت هاوسەرەکەی ناپاکی لەگەڵدا دەکات.
* ئەگەر ئەموستیلەکەی بەچەن درهەمێك فرۆشت یاخود بەساوەر یان بەرۆنی کونجی بەوتەی شیرین یا پارە لەهاوسەرەکەی جیادەبێتەوە.
* نقێم کوڕە ، ئەگەر نقێمی ئەموستیلەکەی لەکانزایەکبوو دەستەڵاتدارێکی خاوەن شکۆو ماڵ‌و منداڵ‌و ناوبانگی باشە بەمەرجێك نقێمەکەی لەبەردی زەبەرجەدی بەنرخ‌و

بەهابێت ، ئەگەر فەرمانڕەوابێت ئەوە ئازاو گوستاخ و خاوەن شکۆو هەیبەتە.
*ئەگەر لاوبێت رەوشت بەرزو جوانە.
*ئەگەر نقێمەکەی مورووبوو دەستەڵاتدارێکی لاوازو بێهێزو رسوایە.
*ئەگەر نقێمەکە یاقوتێکی سەوزبوو کوڕێکی زانای تێگەیشتووی دەبێت.
*ئەموستیلەی دار ژنێکی دووڕووە یان دەبێت بەخاوەنی موڵك و شتومەك.
*ئەگەر ئەموستیلەیەکیدا بەژنێك ئەوە منداڵی دەبێت.
*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم ئەموستیلەکەم شکا ، ئەویش وتی: ئەگەر خەونەکەت راستبێ ئەوە لەهاوسەرەکەت جیادەبێتەوە، تەنیا سێرۆژی خایاند تەلاقیدا.
*پیاوێکیتر هات بۆ لایو وتی: لەخەودا بینیم ئەموستیلەیەکم لەدەستدابوو دەمی پیاوو رەحمی ژنانم پێ مۆرکرد ، ئەویش وتی: تۆ بانگبێژی، لەکاتی خۆیدا بانگ نادەیت لەمانگی رەمەزانداو خەڵکی لەخواردنو ئارەزووی شەرعی بێبەشدەکەیت.
*ئەگەر بینی لەسەر قوڕێك مۆرکی لێدا ئەو مۆرك بۆلێدراوە لەلایەن خاوەن ئەموستیلەکەوە دەستەڵاتو فەرمانڕەوایی پێدەگات.
*ئەگەر بینی پادشا یا فەرمانڕەوایەك ئەموستیلەکەی خۆی پێداو کردیە پەنجەیو شایستەبوو ئەوە دەستەڵاتو فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت.
*فرۆشتنی ئەموستیلەش جیابوونەوەیە لەژن.
(نابلسی)دەڵێت: ئەموستیلە لەخەودا دڵنیاییو دەستەڵاتو هاوسەرو کوڕو کردارە بەپێی چۆنیەتیو ناوەڕۆکەکەی.
*بەڵگەیە لەسەر ژنو ماڵو دارایی.
*ئەگەر ئەموستیلەیەکی زێڕ ببینێتو هاوسەرەکەی دووگیان بێت کوڕی دەبێت.
*ئەموستیلە بۆ فەرمانڕەوا بەڵگەیە لەسەر موڵكو دەستەڵات ، نقێمەکەی جێبەجێکردنی فەرمانو بڕیارەکەیەتی، نەخشونیگارەکەشی ویستو خوازیەتی.
*شکاندنی ئەموستیلە بەڵگەیە لەسەر تەلاقدانی هاوسەر.
*ئەموستیلەو ئەڵقە کڕینی خانوو یا ئوتومبیل یاخود ئاژەڵە یا بەدەستهێنانی دەستەڵاتە.
*ئەگەر زێڕبوو بۆ پیاو ملکەچیو سەرشۆڕییە ، ئەموستیلەی زێڕ ئەگەر درایە پاڵ پیاوان خۆشیو شادی بەدیکردنە، ئەگەر درایە پاڵ کوڕ کوڕێکی خۆشەویستو شیرینە.
*هەر پیاوێك ئەموستیلەیەکی زێڕی هەبێت فەرمانڕەوا کۆتو بەندیدەکات یان ترسو بیم رووی تێدەکات یا ناڕەحەتیو غەمو پەژارە یاخود

مرۆڤێك لەكوڕەكەی تورە دەبێت یا لەژنەكەی یا لەو بازرگانیەی ئەنجامیدەدات.

* هەروەها دەڵێن: ئەگەر ئەموستیلەی دەستكەوت ژنێكی جوانو خێرۆمەندی دەستگیر دەبێت یان گوێبیستی خێرێك دەبێت شادو دڵخۆشیدەكات.

* ئەگەر ئەموستیلەیەكی دوو نقێمی لەپەنجە كردو یەكێك لە نقێمەكان بۆ نێو دەستیو ئەوی تریشیان بۆ رووی دەرەوەبوو و نەخشو نیگاری هەر یەكێكیان جیاواز نەبێت لەوی دی دوو دەستەلاتی پێدەدرێ یەكێكی دیارو یەكێكی نادیار.

* ئەگەر ئەموستیلەیەكی شیلانو مینا لەپەنجە بكات هەژاری نامێنێت.

* ئەموستیلەی سولەیمان - سەلامی خوای لێبێت- هەر پادشاو فەرمانڕەوایەك لەپەنجەی خۆیدا ببینێ بەڵگەیە لەسەر فراوانبوونی موڵكو دەستەلاتیو ئازادكردنی وڵاتانو گەیشتن بەخواستو هیوا، دەگونجێت لەپۆستی فەرمانڕەوایی لابرێت پاشان بگەڕێتەوە بۆی.

* ئەگەر بینی ئەڵقە دەنێرێت بۆ كۆمەڵێكو ئەوانیش بۆیدەگێڕنەوە لەو كۆمەڵە كچێك دەستنیشان دەكات دواتر پاشگەز دەبنەوە لێی.

* ئەگەر بینی ئەموستیلەیەكی لەپەنجە دەكەن دەستەلاتەكەی لێدەبەن.

* ئەگەر بینی ونیكردوە شتێكی ناخۆش روودەكاتە فەرمانڕەواییەكەی یاخود ئەو حاڵەی كەوا تێدایە.

**ئەمەگداری:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزیو سوودو قازانج بەتایبەت ئەگەر یەكێكیان لەكاتی بێداریدا ئامادەبوو.

**ئەنجامدانی كاری خێر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی كاری خێر ئەنجام دەداتماڵو سامان بەدەستدەهێنێ.

* ئەگەر بینی ماڵو سامانی لەرەزامەندیو گوێڕایەڵی خودایا خەرجكرد ماڵو سامانی دەستگیردەبێ بەپێی ئایەتی: ﴿وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ﴾ (البقرة: ٢٧٢).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر خێری ئەنجام نەداو لەجەنگدابوو سەرناكەوێت، ئەگەر بازرگانیەكی هەبوو زەرەردەكات تێیدا.

**ئەندازە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا غەمو پەژارەو توهمەتو شەڕو زیانێكی شەكەتكارە.

**ئەندازیار:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر وێرانبوونو

شوێنی ئاوەدان و ئاوەدانکردنەوەی شوێن و جێگەی وێرانە و کاول.

*ئەگەر بینی لەخەودا بوە بەئەندازیار تەمەندرێژ دەبێ بەهۆی درێژی هیواو بەدەستهێنانی شکۆمەندی و فەرمانبەرداری و رێگری.

*دەگونجێت ببێت بەمارەبڕ یان دادوەر یاخود شاعیرو بوێژ.

*ئەگەر پادشایەك بینی بوە بەئەندازیار لەسەر زەویدا دەبێت بەخاوەنی بانگەوازو زۆرو رێنومایی کراو دەبێت لەوەی دەیکات.

*هەروەها بینینی ئەندازیار بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی دوای هەژاری و لەشساغی دوای نەخۆشی.

**ئەندێشەو خەیاڵی مرۆڤ لەبەر رۆژدا:**

لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دنیاو ئاڵۆ والابوونی، لەگەڵ جیاوازی حاڵو باری دانیشتوانی.

*دەگونجێت بینینی ئەوە لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر:

+تەوبەو رێنومایی.

+یەکتاپەرستی.

+بیرکردنەوە لەپەروەردگارو بەندەکانی.

*ئەگەر لەخەودا مرۆڤ بزوا بەلام ئەندێشەو خەیاڵەکەی دەرنەکەوت بەڵگەیە لەسەر:

+پووچەڵبوونەوەی بەڵگەکانی.

+رێگری و مەرگ.

+پوچەڵکردنەوەی جموجووڵ و هەستیارەکانی.

*هەروەها ئەوەی ئەندێشەو خەیاڵی لەدەستبدات لەبەرتیشکی خۆر یاخود لەبەر رووناکی چرا یان شەوقی ئاودا هەربەو چەشنەیە.

*وابەستەبوونی بیرو ئەندێشە بەسەماو هەڵپەرکێ بەڵگەی درۆو بوختانە لەگەڵ خواردنی ماڵی خەڵکی بەناحەق و درۆ لەگەڵ خەڵکی لەدین و دنیادا.

*قسەکردن لەسەر زوبانی کەسانیترو جوولانی بەڵگەیە لەسەر ئامادەکردنی جنۆکەو قسەولێدوان لەسەر زوبانیان یاخود فتنەو شەڕو خراپە.

**ئەیوب (سەلامی خوای لیبێت):**(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی (ئەیوب) ببینێ (سەلامی خوای لێبێت) ئەوا لەنەفسی

خۆیو ماڵو منداڵی تاڵی دەچێژێ، پاشان خوداوەند پاداشتی دەداتەوە بەزیاتر لەوەی لەدەستیداوە بەپێی ئایەتی ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ﴾(ص:٤٣).

(نابلسی) دەڵێت: بینینی (ئەیوب) (سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەیە لەسەر بەلاو نەهامەتیو لەدەستدانی خاوخێزانو ماڵودارایيو بەخشینی ئارامیو دانبەخۆداگرتن لەسەری.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی لەدەستی دەردەچێت لەماڵو مناڵ.

*دەگونجێت خەوبین سوێند بخواتو پێویستی بەزاناو شارەزایەك هەبێت پرسیاری لێبكات.

*ئەگەر خەوبین نەخۆشبوو چاكدەبێتەوەو دەردو نەخۆشی لەكۆڵ دەبێتەوە یان دەگات بەویستو ئاواتەكانیو دوعای گیرا دەبێت.

*ئەوەی جلوبەرگی ئەو بپۆشێت بەلاو نەهامەتی رووی تێدەكاتو دەردو نەخۆشی دەگرێت پاشان هەموو ئەو نەهامەتیو نەخۆشیانە دەڕەوێتەوەو لای گەورە پیاوان بەباشە باسی دەكرێت.

*هەروەها دەڵێن: بینینی بەڵگەیە لەسەر بەلاو نەهامەتیو تاكو تەنیاییو مژدە بەسەربەرزیو پاداشت.

*ئەگەر ژنێك لەخەودا (ئەیوب)ی بینی بەڵگەیە لەسەر دزینی ماڵو داراییو بەدەركەوتنی حاڵو باریو، دەرەنجامی بەخێرو باشە كۆتایی دێت.

*ئەگەر نەخۆشێك بینی دەمرێتو پەروەردگار بەزەیی پێدا دێتەوە چونكە ناوی بەزەیی لەخۆ گرتووە.

## ئـ ی

**ئیحرام بەستن:** (نابلسی) دەڵێت: ئیحرام بەستن بۆ حەج یان عەمرە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جیابوونەوەی هاوسەردار، خۆئەگەر نەخۆشبوو دەمرێتو لەجلو بەرگی دووراو بێبەش دەبێت ، ئەگەر شەڕەنگێزو خراپەكاربوو لێدەبڕێت بۆ حەرام بەتایبەت ئەگەر لەكاتو وادەی حەجدا نەبوو ، یان رەنگی ئیحرامەكەشی رەش بوو یا عەورەتی تێیدا بەدەركەوت.

بینـیٚ سیاسـەتمەداریو ڕەوانبێـژی پێدەبەخـشریٚ ، هــەروەها وتــراوە: مزگـەوت دروسـتدەکات یـان دادەنـریٚ بەسەرپەرشتیاری بەپێی ئایەتی: ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْـرَاهِيمُ الْقَوَاعِـدَ مِـنَ الْبَيْـتِ وَإِسْمَاعِيلُ﴾(البقرة: ١٢٧).

وتراویشە: ئـەوەی (ئیسماعیل) ببینـیٚ ناڕەحەتی لەباوکیەوە پێدەکات پاشان خوداوەند ئاسانی دەکات لەسەری.

(نابلـسی) دەڵێـت: ئـەوەی لەخـەودا بیبینـیٚ ڕەوانبێـژیو پلەوپایـەی پێدەبەخـشرێت ، یـان مزگـەوت بنیـاد دەنیٚ.

* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسـەر ئەوەی مرۆڤێك پـەیمانێکی ڕاستی پـیٚ بدات.

**ئیفلیجـی**: (نابلـسی) دەڵێـت: ئەگـەر بینی هەردوو دەستی تووشـی ئیفلیجی هـاتوون گونـاهێکی گـەورەو مـەزن ئەنجامدەدات، ئەگـەر دەستی ڕاسـتی تووشـی ئیفلیجـی هـاتبوو لەکەسـێکی بێتاوانـــدەداتو ســـتەم لـــەلاوازو زەبوونێکدەکات، ئەگەر دەستی چـەپی تووشـی ئیفلیجـی هـات بـراو خوشـکی دەمریٚ.

* ئەگـەر پـەنجـەی شـەهادەی وشـکبوو کوڕەکەی دەپێکریٚو ، ئەگەر پەنجەی ناوەڕاسـتی وشــکبوو خوشـکی دەپێکریٚو ئەگەر پەنجەی شەهادەیبوو کـچەکەی دەپێکـریٚو ئەگـەر پـەنجـەی گەورەیبوو دایكو خانەوادەکەیەتی.

* هەروەها دەڵێن: گفتو بەڵا لەدەستدا بەڵگەیەلەسەر ڕوودانـی گرفـت لـەنێوان براداو پەنجەکانیش براو کوڕن.

* هەروەها ئەگەر بینی دەستی ڕاستی تووشـــی ئیفلیجـــی هـــاتوە بـــژێوی پەکیدەکەوێتو دەوەستیٚ.

**ئینجیـل**: هەرکەسـێك لەموسـوڵمانان ببینـــیٚ ئینجیلێکـــی بەدەســـتەوەیە گۆشــەگیرو یــەکلایی دەبێتــەوە بــۆ بەندایەتیو پـەرێز دەکـات لـەدنیاو ڕوو لەزوهدو تەنیایی دەکات.

* ئەگــەر پادشـــاو دەســـتەلاتداربوو زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا.

* دەگونجێت بینینی ئینجیل بەڵگەبێت لەســەر درۆو بوختــانکردن بــۆ ژنــی مێرددار.

* دەگونجێت لەشەڕو پێکداداندا زاڵبێت ئەگــەر دادوەربێــت ، خــۆ ئەگــەر

شاهیدبوو شەهادەی درۆ دەدات یان قسە لەسەر باسو خواستێك دەكات پەیوەندی بەوەوە نییە، ئەگەر نەخۆشبوو چاكدەبێتەوە.

*هەروەها دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر زانستی ئەندازیاریی یاخود فێربوون لەسەر دەستی زانایان.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر كتێب یاخود گۆرانی بێژو وێنەگر.

## ئـ ی

**ئێرەیی بردن:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئێرەیی بردن زیانی ئێرەییبەرەو سوودیشە بۆئەوەی ئێرەیی پێدەبەن.

(نابلسی)دەڵێت: ئێرەیی بردن بۆخاوەنەكەی بەڵگەیە لەسەر هەژاریی و نەداریی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سینە پیسیو خۆبەزلزانینو جادوو شەڕ، بۆ ئێرەیی پێبراویش زیادبوونی رزقو رۆزییە.

**ئێسقان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت : ئەگەر بینی بوە بە ئێسقان بەچەشنێ لەشولاری لەشێوەی خەڵكی زۆر گەوورەتربوو بەڵگەی مردنیەتی.

**ئێسكگرتنەوە:** (نابلسی)دەڵێت: نزیكییە لەهەژارانەوە بەلێبوردەیی و بەرزكردنەوەی پلەوپایەو ملكەچی بۆ خاوەن شكۆ.

**ئێسكگرەوە( پزیشكی ئێسكو جومگە ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: فەرمانڕەوایەكی خاوەن پیشەیەو حەقو ماف رێكدەخاتو دادوەر جێگیردەكاتو خێر لەسەر دەستیدا جێگیردەبێت.

*ئەگەربینی زامێك لەگەروویدا هەڵتۆقیو وەستا لەسەر ئێسكگرەوەیەك بەئاسن برینەكەبكاتەوە هەتا سەرجەم كێمو زوخمی لێدەربێت، بەڵگەیە لەسەر گەواهیدانو پاراستنی گەردنو قەرزدانەوەو دەرووی خێر لەسەر دەستی.

*ئەگەربینی جومگەكانی یان ئێسكەكانی لەیەك جیابوونەوە ئێسكگرەوەیەك بەیەكیەوە نووساندەوە بۆیو لەشو لاری تەندروستو ساغبوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی جلوبەرگی دەبات بۆ بەرگدروو.

*ئەگەر لەدەستی راستدابوو ئێسککرەوە کاری لەسەرکرد پیاوێك بەچاکەی ناچاریدەکات، ئەگەر لەقاچیدابوو یان لەقاچێکدا لێکدانەوەی بەو چەشنەیە مەگەر خاوەن ئاژەڵ یان ئوتومبیل بێت ئەجا دەگونجێت رووداوێك بێت بەسەریا.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەمەزن دانان و هەنگاونان.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر:

+غەموپەژارە.

+ئەندازیار.

+ساختمان.

+بەخشندە بۆ هەژاران.

*ئەگەر لەخەودا چارەسەریکرد یارمەتی ستەمکاران دەدات لەسەر ستەمەکەیان.

*هەروەها بینینی ئێسککروە بەڵگەیە لەسەرئەوەی خێر لەسەر دەستی ئەودا روودەدات.

**ئێسکی ئاژەڵ و مرۆڤ:** لەخەودا ماڵ و دارییە کەدەدرێتەپاڵ ئەوەی ئێسکی دراوەتەپاڵ و بەڵگەیە لەسەر داپۆشین بۆ یەکێك ببینێ: ﴿فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا﴾ (المؤمنون: ١٤).

*هەروەها ئێسك بەڵگەیە لەسەر کۆڵەکەو سەرچاوەی ماڵ و دارایی.

*ئێسك بەڵگەیە لەسەر کاری مەزن و گەورە ، ئەوەی ببێ بەخاوەنی ئێسك دەبێت بەخاوەنی ئاژەڵ یاخود دەبێت بەخاوەنی ماڵ و خانوو و ئاژەڵ یان دەبێت بەخاوەنی ماڵ و خانوو چونکە ئێسك وەك بینا وایە.

*ئێسکی مرۆڤ بەڵگەیە لەسەر ئەو ماڵ و داراییەی حاڵ و باری پێدەچێت بەرێوە وەك ئاژەڵ و کشتوکاڵ و هەموو هۆکارێکی بژێوی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەو بینایەی ماڵ و سامانی پێ بەرزدەبێتەوە لەگەڵ ئەوەی مرۆڤ پێیدەچێت بەرێوە وەك هاوسەرو منداڵ و ئاژەڵ و...

*ئەگەر ئێسك لەخەودا شکا یاخود رەشداگیرسا ، ئەوەی بەڵگەیە لەسەری دەمرێ ئەگەر نەخۆشبوو بەڵام ئەگەر لەشساغبوو نامرێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەمەزنگرتن، ئەگەر ئێسکەکەی زبربوو

یان گەورەبوو بەڵگەیە لەسەر بەمەزن زانینی خاوەنەکەی.

*بینینی ئێسقان بەڵگەیە لەسەر خراپی بۆچوون.

*بینینی ئێسك بەتەنیا بەڵگەیە لەسەر جل‌وبەرگی نوێ.

*دەگونجێت بینینی ئێسقان بەڵگەبێت لەسەر کۆکردنەوەی داروپەردووی‌و بیناو ساختمان.

*دەگونجێت بینینی ئێسقان بەڵگەبێت لەسەر دەرخستنی نهێنی‌و ئاگاداربوون لەکاروباری پەنهان‌و نهێنی.

*ئەگەر ئێسقانی بوو بەئاسن لەخەودا نەخۆشییەکی گەورە دەگرێ یان زۆر بەلاَو نەهامەتی رووی تێدەکات‌و ئارامدەگرێ لەسەری.

*ئەگە ئێسقانی لە(عاج)بوو بەڵگەیە لەسەر پڕبوونی لەحەرام.

*دەگونجێت ئێسقان بەڵگەبێت لەسەرداروو درەختی بەردار چونکە توێکڵی هەیەو بەروبوومەکەشی مرۆڤ سوودی لێوەردەگرێ.

*هەروەها ئێسقان بەڵگەیە لەسەر لەش ساغی‌و نەخۆشی.

**ئێش‌و ئازار:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئێش‌و ئازار پەشیمانبوونەوەیە لەگوناهو تاوان.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی پشوویداوە ماندوو دەبێت‌و ماندوبوون‌و هیلاکی‌و پشوودانە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر ددانێکی ئێش‌و ژانی تیابوو گوێی لەگوتەیەکی نارێکدەبێت لەکەسێکی نزیکی‌و ددانەکە دەدرێت پاڵ خراپی مامەڵە هەتا سکالاَو شکاتی لێدروست دەبێت ، دەگونجێت ئازاری گەردن‌و مل بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی ناپاکی لەگەڵ ئەسپەردەو ئەمانەتکردوەو بەجێی ناهێنێت تا سزاو خەشمی خوایی بەسەرا دا دەبەزێ.

*ئێش‌وئازاری سك بەڵگەیە لەسەرئەوەی ماڵ‌و سامانی لەسەرپێچیدا بەگەڕخستوەو پەشیمانە لێی.

*هەروەها دەڵێن: ئێش‌و ئازاری سك بەڵگەیە لەسەر تەندروستی خزم‌و کەس‌وکارو خانەوادە.

*ئێش‌وئـازاری نـاوك بەڵگەیـە لەسـەرئەوەی بەخراپی مامەڵە لەگەڵ هاوسەرەکەی دەکات.

*ئێش‌وئـازاری دڵ بەڵگەیەلەسـەر خراپی نهێنی لەکاروباری ئاینەکەی.

*هەروەها ئێش‌وئازاری جگەر بەڵگەیە لەسەر خراپی لەگەڵ کوڕدا.

*ئێش‌وئـازاری سـپڵ بەڵگەیـە لەسـەر خراپی ماڵو سامان کـەوا ژین‌و بـژێوی ماڵو خانەوادەی پێوەیە، ئەگەر ئێش‌و ئـازاری زیـادیکرد تـا لـەلێواری مـەرگ نزیکبـوەوە بەڵگەیـە لەسـەر ڕۆیـشتنی ئاین.

*ئێش‌وئازاری گورچیلە بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونـەوەی چـارەنووس‌و ئەجـەل چونکە گورچیلە وەك ڕوح وایە.

*ئێش‌وئـازاری پـشت بەڵگەیـە لەسـەر مردنـی براکـەی ، هـەروەها دەڵـێن: ئێش‌وئـازاری پـشت لێکدانـەوەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پەناو پشتگیری پیاوە لەکوڕو بـاوك‌و سـەرۆك‌و هـاوڕێ، ئەگـەر پـشتی چـەمابویەوە بەڵگەیـە لەسەر هەژاری‌و پیری.

*ئێش‌وئـازاری قـاچ بەڵگەیـە لەسـەر ڕۆیـشتن لەگوێڕایـەڵی پـەروەردگاردا، گوتراویشە: ئێش‌و ئازاری قاچ بەڵگەیە لەسەر زۆری ماڵو سامان.

*ئێش‌و ئازاری ئامرازی نێرینە بەڵگەیە لەسـەر خراپبـوون لەگـەڵ نەتـەوەو کۆمـەڵێك کـەوا بەخراپـە باسـیدەکەن‌و دوعاو نزای لێدەکەن.

**ئێـوارە ( سـەرەتای شـەو ):** (نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر دەسـتبڕین‌و درۆو سـەرهەڵدانی فتنـەو لەخۆباییبوون بەپێی ئایەتی: ﴿وَجَاءُوا أَبَاهُمْ عِشَاءً يَبْكُونَ﴾ (يونس: ١٦).

*دەگونجێت بینینـی ئێـوارە لەخـەودا بەڵگـەبێت لەسـەر یـادو زیکـری خـوا بەپێی ئایـەتی: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾ (غافر: ٥٥).

# بێ

## با

**باپیر:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودابینی بوە بەباپیر تەمەنی درێژدەبێتو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوە، باپیریش لەخەودا لەجێی باوکە، لێکدانەوەی وەك ئەوەیە کەلەباوکدا باسکراوە، دەگونجێت باپیری بمرێت لەخەودا و ئەمەش لاوازکردنی هەوڵو تێکۆشانییەتی.

**باتێکەر:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا وەزیرە چونکە ئاگر دەستەلات ، بینینی باتێکەر بەڵگەیە لەسەر:

+زیندوکردنەوەی یادو باسو چارەسەر بۆ نەخۆش.

+گەرانی رزقو رۆزییە.

+بۆ ژنی دووگیان منداڵی نێرینە.

**باج کۆکردنەوە:** (نابلسی)دەڵێت: باج کۆکردنەوە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەزۆر زەکاتدان ، ئەگەر خۆی باجگربوو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەرزبوونەوەی پلەوپایەی یاخود هۆکارێك بێت مۆڵەتی تایبەتو گشتی پێوەربگرێت وەك حەمامو هاوچەشنی ئەوە.

**باجگر:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی باجگر بەڵگەیە لەسەر قەرزدانەوەو پۆلیسو نوێنەرو قسەهەڵگرو ئەمانەتپارێز.

هەروەها دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە خۆی هەڵدەقورتێنێ لەماڵو سامانی کەسانی دیکەدا.

*بینینی باجگر بەڵگەیە لەسەر تەنگەشەو ناخۆشیو خراپەو ئەوەی خوداوەند گوناهی پێدەسرێتەوە.

**باخ(بێستان):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: باخو بێستان بەڵگەیە لەسەر ژن چونکە ئاو دەدرێتو دووگیان دەبێتو منداڵی دەبێت.

*ئەگەر باخەکە ژنبوو کورو ماڵو دارایيو بەروبوومە.

*باخی نادیاریش بەڵگەیە لەسەر قورئانی پیرۆز، چونکە وەك بێستان وایە لەدیدی بینەردا بەردەوام لەبەروبوومەکەی سوود وەردەگرێ.

*دەگونجێت باخی نادیار بەڵگەبێت لەسەر بەهەشتو خۆشیەکانی چونکە عەرەب بەبەهەشت ناوی دەباتو هەروەها پەروەردگار بەوچەشنە ناویدەبات بەئایەتی : ﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ (البقرة:٢٦٦).

*دەگونجێت باخو بێستان بەڵگەبێت لەسەر بازاڕ یان بەڵگەبێت لەسەر ماڵی شایی ، دارەکەی سوودو بەروبوومەکەشی خواردنەکەیەتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەموو شوێنو جێگەو ئاژەڵێك سوودی لێوەربگرێ وەك حانوتو خانو حەمام، چونکە داری نێوباخ وەك گرێیەك وایە بۆ خاوەنەکەی یان خزمەتکار لەگەڵ ئاژەڵی جۆراو جۆری خاوەندار.

*دەگونجێت باخ بەڵگەبێت لەسەر ماڵی زاناو فەرمانڕەوای ڕێکخەری نێوان سەرجەم خەڵکی.

*ئەوەی لەباخێکدابوو تەماشای حاڵو خەوەکەی دەکرێ ئەگەر مردوبوو لەبەهەشتو نازو نیعمەتدایە ، ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێتو رووبەباخو بێستانی نادیار دەچێت، ئەگەر جەنگاوەرو تێکۆشەربوو شەهیدی بەدەست دەهێنێت بەتایبەت لەخەوەکەیدا ژنێکی بینیو بانگیدەکردو شیری خواردەوە یان هەنگوین لەرووبارەکانیو، بەروبوومەکەشی لەو بەروبوومانە نەدەچوو کەدیبووی، ئەگەر بەوچەشنە نەبوو و خەونەکەی بەڵگە نەبوو لەسەر شەهیدبوون تەماشای حاڵو باری دەکرێتو ئەگەر رەبەن بوو ژن دەهێنیتو دەچێتە لای و جووتدەبێت لەگەڵیو ئەو خۆشیە دەبینێت کەلەباخەکەدا دیبوویو بەپێی خەوەکەی خێرو شەڕ دەبینێ.

*ئەگەر خەوەکەی لەکۆتایی رۆژگارو کاتی گەڵاهەڵوەرینو نەمانی بەروبومدابوو هەژارىو حاڵی نابەجێ رووی تێدەکاتو تەندروستی روو لەخراپە بێت.

*ئەگەر لەسەرەتای رۆژو کاتی بەروبوومو بەرهەمهێناندابوو بەپێچەوانەی حاڵی پێشووەوە دەبێت.

*ئەگەر یەکێك ئەوەی بینی کەژنێکی هەبوو دڵی بەجوانیو ماڵەکەیا چوبوو

بەپێی ئەو دوو وادەوکاتەی پێشوو هەڵیدەسەنگێنێ لەگەڵ گوتەو ئاوخواردن‌و خواردنی بەروبووم‌و جووت بوون لەگەڵیدا.

* ئەگەر یەکێك باخێکی دی‌و کاری لای فەرمانڕەوابوو بەڵگەیە لەسەر دوایی کاروبارەکەی‌و بێبەشبوونی لەمافی.

* ئەو بەروبوومەشی دەیچنێتەوە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خێر یان شەڕ بەپێی لێکدانەوەی بەروبووم.

* ئەوەشی خۆی ببینێ لەگەڵ کۆمەڵێکدا کەهاوبەشی بن لەبازاڕو پیشەکەیدا ئەو باخە بازاڕەکەیانەو بەڵگەیە لەسەر دووڕوویی‌و بازاڕ ساردی بەهەردوو کاتەکە.

* هەروەها ئەگەر خێرو شەڕی تیا بەدیکر دەگەڕێتەوە بۆ خۆی مەگەر ئەوە بەدیبکات کرێگرتەیەك یان خزمەتکارێك میزی تیا بکات یاخود ئاوی بداتێ لەسەرچاوەی یەکێکیتر یا بیری یەکێکیتر ئەوکاتە پیاوێکە ناپاکی لەگەڵ دەکات لەخانەوادەکەیداو دەستی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا تێکەڵکردووە.

* ئەگەر خۆی بکەربوو لەوباخەداو میزەکەی خوێنبوو یاخود لەدەریایەکیترەوە ئاوی لەبەر دەڕۆیی دەچێتە لای ژنێك ئەگەر باخەکە نادیاربوو، وەگەرنا دەچێتە لای ژنەکەی بەچەشنی حەرام وەك ئەوەی لەدواوە بچێتە لای یان لەکاتی عادەی مانگانە یان دوای تەڵاق خواردن‌و کەوتنی سوێنەکەی.

* هەروەها دەڵێن: باخ‌و مێوو باخچە بریتییە لەداوای لێخۆشبوون، باخچەش هاوسەری پیاوە بەپێی جوانی مێوەکانی‌و بەهێزیان لەگەڵ بەروبووم‌و ناواخنیان‌و، زبری‌و رەقی لاسکەکانیش قەڵەوییەو درێژی تەمەنیانەو فراوانیشی گوشادی دنیایە، ئەگەر بینی مێوێك بەری زۆر گرتووە دنیا ئاوەڵاو فراوان دەبێت، ئەوەشی ببینێ ئاودێری باخەکەی دەکات دەچێتە لای خێزانەکەی.

* ئەوەی دەچێتە باخێکی نادیارو دەبینێ گەڵاکانی هەڵوەریوە خەم‌و پەژارە رووی تێدەکات، ئەوەی باخەکەی بەوشکبوویی دەبینێت خۆی لەچوونەلای ژنەکەی دەپارێزێت.

(نابلسی)دەڵێت: باخ لەخەودا داوای لێخۆشبوونە، لێخۆشبوونیش باخە، ئەوەی ببینێ ئاودێری باخەکەی دەکا دەچێتە لای ژنەکەی، ئەگەر باخەکەی بەوشکبوویی بینی ژنەکەی گۆشەگیرە

لەشـــوەکەی، خۆنەگـــەر باخەکـــەی یەکێکیتر ئاویدا ئەو ئاودێرە خیانـەتو ناپـــاکی لەگەڵـــدەکات دەربـــارەی ژنەکەی، ئەوەشی روو لەباخێکی نادیار بکـاتو ببینـێ گـەڵاکانی هـەڵوەریون خەمو پەژارە رووی تێدەکات.

*ئـەوەی لەخـەودا رووبکاتـە باخێـکو چـوونەکەی لـەکاتی بەروبوومـدابێت بەڵگەیـە لەسـەر خێـرو رزقوکـرداری چاکەوو ژنهێنـانو منـاڵ، بـەلاّم ئەگـەر چـوونەکەی لـەکاتی بـەروبووما نـەبوو کاتێکبوو گەڵا دەوەری بەڵگەیە لەسـەر بەدەرخـستنی حـاڵو بـارو قـەرزاریو تەلاقـدانی ژنو لەدەسـتدانی منـاڵ، ئەگـەر ئـەوەی رووی‌کردبـووە باخەکـە مردوبوو لەبەهەشتدایە، ئەگـەر بەسـەر زینـدوبوو دەگونجێـت سـتەمکاربێتو ئـاینی لاوازو سـستبێتو متمانـــەی پێنـەکرێ، ئەگـەر دەسـتەلاّتی بەسـەر باخەکـەدا شـکا پلەوپایـەو شـکۆمەندی بەدەســـت دەهێنێـــت، وەگـــەرنا زیادەرەوەدەبێت.

*دەگونجێت چوونە ناو بـاخ بەڵگەبێت لەسـەر ژنو منـاڵو مـاڵو دارایـیو خۆشـگوزەرانیو رەوانـەوەی خـەمو پەژارە.

*دەگونجێـت بـاخ بەڵگـەبێت لەسـەر شوێنی بانگکردنی میوانەکانی ئاهەنگی ژنهێنان کەتێیدا خـواردنی جۆراو جۆر دروسـت دەکرێـت یـاخود بەڵگـەبێت لەسـەر مـاڵی فـەرمانڕەوا کەتێیـدا سـەربازو ئەفسەری پلـە جۆراو جۆرە کۆدەبنەوە.

**باخچە(باخ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: باخـچەیەکی نادیـاری نـاوازە کـەوا بەهەمیـشە سـەوز نـاوزەد دەکـرێ بەڵگەیە لەسەر ئیسلام بەهۆی شەوقو پرشنگییەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەم چەشـنە لێکیدلوەتـەوە، دەگونجێـت لەئیـسلامدا بەڵگـەبێت لەسـەر هـەموو شـوێنێکی خـۆشو چـاکو جێگەیـەک دوعـــاگۆی پـــەروەردگاری تێـــدا ئەنجامبـدات وەک گڵکـۆی پێغەمبـەر (ﷺ)و ئەڵقەی زیکرو یادی خواو شوێنی پیاوچـــاکان بـــەهۆی فەرمایـــشتی پێغەمبەر(ﷺ) کەدەفەرموێت: "لەنێوان گـۆڕی مـنو دوانگەکەمـدا یـەکێک لەباخـچەکانی بەهەشـت هەیـە یـاخود چاڵێک لەچاڵەکانی دۆزەخ".

*دەگونجێت باخچە بەڵگەبێت لەسەر:

+قورئان.

+هـەموو کتێبێـک دانـاییو زانـایی تێدابێت، ئەمـەش لـەو وتەیـەوە هـاتوە

کەدەڵێت: "کتێب باخچەی دانایانو گەشتی زانایانە".

*دەگونجێت باخچە بەڵگەبێت لەسەر بەهەشت، ئەوەی لەباخچەیەك بچێتە دەرەوە بۆ زۆنگێك یاخود زەوییەکی رەش یا سوتماککراو یان زەویەکی پڕ لەدووپشكو مار یان خۆڵەمێشو زبڵ یان کەوتنە نێودەریاوە تەماشای حاڵوباریدەکریّ ئەگەر مردوو بوو لەبری بەهەشت دۆزەخی پێدەبەخشریّو لەبری نازو نیعمەت سزاو خەشمو قین ، ئەگەر موسوڵمانێکی زیندوو بەدیکرا بەدەردەکەویّ لەئیسلام بەبێباوەڕی بیدعە یاخودبەگوناهی گەورەوگران.

*ئەگەر یەکێك خۆی لەباخچەیەکدا بەدیکردو سەوزەو بەروبوومی دەخوارد یاخود کۆیدەکردەوە ئەگەر لەرۆژانی (حەج)دابوو یان بانگبێژی تێدابوو ئەوە (حەج)ە، ئەگەر لە(مەککە)بوو ئومێدەواربوو زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر بکات بۆی بەدی دێتو زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات، سەرباری ئەوەش چی کۆدەکاتەوەو دەیخوات پاداشتە بۆی.

*ئەگەر بێباوەڕێك ئەوەی بینی ئەوە موسوڵماندەبێتو سینەی ئاوەڵاو فراواندەبێت بۆ وەرگرتنی ئیسلام، ئەگەر گوناهباربوو تەوبەدەکاتو پاشگەزدەبێتەوە، ئەگەر زانستپەروەرو قورئان خوێنبوو بەئەندازەی خواردنو کۆکردنەوەی دەبێت، وەگەرنا ئەوە پاداشتی کارێکە لەرۆژەکەی یان شەوەکەیدا ئامادەیبوە وەك چوون بۆ نوێژی هەینی یا نوێژی مردوو ئەنجامدان یاخود سەردانی گۆڕی پیاوچاکان.

(نابلسی) دەڵێت: ئەوەی باخچەی سەوز ببینێت لەخەوداو ناواخنی نەزانێت ئیسلامو ئاینە، هەموو سەوزاییەکیش لەسەرزەویدا هەر بەو چەشنەیە.

*ئەگەر باخچەیەك ببینیّ کەمێك زەرەری پێدەگات.

*ئەگەر مردوویەکی بینی لەباخچەدا خەلاتە لەبەهەشتدا بەدەستی دەهێنێت.

*باخچە بەڵگەیە لەسەر :

+دنیاو جوانکاریەکانی.

+هاوسەرو ماڵو سامان.

**باخچەی ماڵ:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر پاکیزەیی ژنو پیاوو بەرپەرچدانەوەی گومانو دوودڵی لەبارەی ماڵو منداڵەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چرووکی‌و رێگری داواکار لەزانیاری‌و هاوکاری.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو کردارانەی بەپەنهان‌و نهێنی ئەنجام دەدرێت‌وو هیچ کەس نایزانێ وەك رۆژوو شەونوێژ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خواناسی‌و یادو زیکری پەروەردگارو پیرۆزکردنی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرگیری لەگەڵ خزم‌و کەس‌وکاردا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شێتبوونی ئەوەی لەماڵدایە یاخود غەرامەو خەرجی.

**باخەوان:** (نابلسی) دەڵێت: باخەوان لەخەودا پیاوێکە بانگەوازی خەڵکی دەکات بۆ لای ژنان‌و خۆشویستنیان، بینینی باخەوانیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەڵدەستێت بەبەڕێوەبردنی کاروباری قوتابخانەو مزگەوت‌و کەنیسەو لەشایی‌و خۆشی‌و رزق‌و رۆزی سوود دەبینێ.

**بادان( لوولکردن ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی پەتێك بادەدات یان دەیئاڵێنێت لەخۆیەوە یاخود لەشتێکەوە دەیئاڵێنێ سەفەردەکات.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر دانەوێڵەی بادەدا فەرمانی جێبەجێدەکرێ، ئەگەر ئەوەی لوولیدەکرد ئەستوربوو بەڵگەیە لەسەر سەفەرو سوودمەندبوون.

*ئەگەر بادانەکەبۆی ئاسانبوو سەفەرەکەی ئاساندەبێ.

*ئەگەر بینی ریشی بادەدات‌و دەیکات بەپەت بەرتیل وەردەگرێ یان گەواهی بەتاڵ‌و پووچەڵدەدات.

*دەگونجێت پەتبادان بەڵگەبێت لەسەر بەستنی کاروبار یان شەریکایەتی یاخود هاوسەرگیری.

**باران:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: باران بەڵگەیە لەسەر سۆزو بەزەیی خوایی‌و ئاین‌و دەرووی خێری، هەروەها بەڵگەیە لەسەر قورئان‌و دانایی، چونکە باران بژێوی زیندەوەران‌و ژیاندنەوەی زەوی تێدایە ، لەگەڵ لەدەستدان‌و تیاچوونی خەڵکی‌و ئاژەڵ‌و زیندەوەران.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر فەڕو پیت‌و خۆشحاڵی‌و هەرزانی‌و دەوڵەمەندی ، چونکە هۆکاری ئەوەیە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کارەسات‌و رووداو لەئاسمانەوە وەك کوللە یان سەرماو رەشەبا بەتایبەت ئەگەر ئاگری لەگەڵبوو یاخود ئاوەکەی

گەرمبوو چونکە خوداوەند لەقورئاندا گوزارشتی لەوەکردوە کەواچی بەسەر نەتەوەکانی تردا هێناوە لەسزاو خەشمی بەباران‌و دەفەرموێت: ﴿وامْطَرْنا عَلَيهِمْ مَطَراً ، فَسَاءَ مَطَرُ المُنْذَرِين﴾(الشعراء:١٧٣).

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر فتنەو ئاشوب‌و خوێنی رژاو بەتایبەت ئەگەر ئاوەکەی خوێنبوو.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر نەخۆشی گەری‌و ئاولە ئەگەر لەکاتی خۆیدانەبوو یاخود کاتی زەرەریبوو.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەرئەوەی دابەزیوە بەسەر دەستەلاتداردا لەسزاو خەشم‌و زەرەو ئەگەر لەبری باران ماریاری.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر چارەسەرو رێگری‌و پشوو بۆ موسافیرو گەشتیاران‌و پیشەوەران، هەرکەسێك کارێك ئەنجام بدات لەژێر هەوایەکی دیاردا، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿انْ كانَ بِكُم اذىً مِنْ مَطَرٍ﴾.

*ئەگەر بارانێکی گشتی ببینێ لەولاتداو خەلکی لەنارەحەتیدابن فەرپوییت‌و بەرەکەت دەرژێ بەسەریانداو هەرزانی بلاودەبێتەوە.

*ئەگەر لەژێر ستەم‌و زۆرداری‌و نەخۆشیدابوون دەروویان لێدەکرێتەوە بەمەرجێك باران لەوکاتەدا بەسوودبێت، ئەگەر بەزیانبوو یاخود بەردی تێدابوو ئەوحالەی تێیدان پتر دەبێ بەئەندازەی هێزی بارانەکە ، ئەگەر هەرنمەبارانێکبوو سووك‌و ئاسانە.

*ئەگەر خۆی لەنێوباراندا بینی یاخود گەمارۆدرابوو لەژێر سەربانێکدا یان دیوارێ، زیان بەقسەو ئازاردان رووی تێدەکات.

*ئەگەر بەبارانەکە خۆی شت بەهۆی لەشگرانی‌و دەم‌وچاوی بینایی بۆ دەگەرێتەو ئەگەر بێباوەربوو موسولماندەبێت ، ئەگەر گوناهباربوو تەوبەدەکات، ئەگەر هەژاربوو خوداوەند دەولەمەندیدەکات ، ئەگەر خوازیاری پێداویستییەکبوو لای دەستەلاتدار بەدەستی دەهێنێت.

*هەمووبارانێك جۆرەکەی باش بێت باشەو بەپێچەوانەشەوە.

*(ئیبن سیرین)دەلێت: لەقورئاندا لەکاتی باسی باراندا باسی دەرووی خێرنەکراوە بەلکو غەم‌و پەژارەیەك وەك ئایەتی:﴿ وامْطَرْنَـا عَلَـيهِم مطَرَا﴾(الاعراف:٨٤)و ﴿وامْطَرْنا عَلَيهِمْ حِجَارَةً﴾ (الحجر:٧٤)ئەگەر بارانەکە

نـاوزەد نـەكرا دەرووی خێـرە بـۆ سەرجەم خەڵكی بەپێی ئایەتی ﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُّبَارَكًا﴾(ق:٩).
*هەندێكدەڵێن: بـاران بەڵگەیـە لەسـەر قافڵـەو كـاروانی دوابـەدوای حوشـتر، هەروەك چۆن كاروانی حوشتر بەڵگەیە لەسەر باران.
*ئەگەربیبینی ئاسمان شمشێری باراندا خوداوەنـد خـەڵكی تاقیدەكاتـەوە بەدەمەقاڵەو ئاژاوە.
*ئەگـەر لەئاسمانـەوە كاڵـەك بـاری خەڵكی نەخۆشدەكەون.
*ئەگـەر بـەبێ هـەور بارانبـاری خـراپ نییـە چـونكە بـاران لەئاسمانـەوە دەبارێت.
*هـەروەها دەڵـێن: دەرووی خێـرە لەلایەكەوە چاوەڕێنەكراوە.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ئەگەر زیانی نەبوو خێرو رزق و رۆزیو رەحمەتە.
*دەگونجێـت بـاران بەڵگـەبێت لەسـەر ژیـانی ئـەوەی ترسـی هەیـە لـەمرۆڤو زەوی.
*دەگونجێـت بـاران بەڵگـەبێت لەسـەر بـەجێهێنانی ئـەوەی مـرۆڤ بـەڵێنی پێدەدات.
*ئەگەر بارانەكە تایبەتبوو بەشوێنێكی دیـاریكراو بەڵگەیـە لەسـەر غـەمو پـەژارەی خانەوادەكـەی یـان غـەمو پەژارەیـەك روو لەخەوبینـەر دەكـات بـەهۆی لەدەسـتدانی كەسـێكی ئازیزەوە.
*ئەگـەر بارانەكـە گـشتیو بـەزیانبوو وەك ئەوەی ئاسمان خوێن ببارێنێ یان بـەرد ئـەوكات بەڵگەیـە لەسـەر گونـاهو تاوان، ئەگەر خەوبینـەر لەسەفەردابوو دەگونجێت سەفەرەكەی بوەستێ.
*دەگونجێـت بـارانێكی بـەزیان لەشوێنێكی تایبەتدا بەڵگـەبێت لەسـەر دزیوكـەمو كـوڕی لەكێـشانەدا یـاخود بوونی خاڵی چوونیەك لەگەڵ گەلەكـەی (لوط)دا.
*دەگونجێت بارانی بەسوود بەڵگـەبێت لەسەر فریاكەوتنی زۆر بۆهاتوو.
*بـاران كـاروانو قافڵـەی حوشـترە، هەروەك چۆن كاروانی حوشتر بارانە.
*ئەگەربیبینی ئاسمـان بـارانی باراندوەو لەهەموو لایەكەوە بـاران بـاری خـەڵكی فراوانیو خۆشـحاڵی دێـت بەسـەریانداو سەرچاوە ئاوەكان دەتەقن.
*ئەگـەر بـارانێكی گـشتی بینـی كاروبـارێكی مـردووی بـۆ زینـدوو دەبێتـەوەو خێـرو فـەڕو نیعمـەتی دەسـتگیر دەبێـت، ئەگـەر غـەمباربوو یـاخود قـەرزار دەرووی خێـری لێدەكرێتەوە.

*ئەگەر بینی بەخێرایی و کتوپڕ هات بەسەریا رزق و رۆزییەکی فراوان و باشدەدرێ و لەهەموو تەنگەشەیەك قوتاردەبێ.

*باران دەرووی خێرە لەو ساڵەدا.

*ئەگەر بارانی لەماڵەکەی خۆیدا بینی بەدەر لەخەڵکیتر خێروسوودو رێزی دەستگیردەبێ، ئەگەر لەسەرجەم ولاتدابینی لێکدانەوەکەی بۆ سەرجەم خەڵکی ئەوشارەیە.

*ئەگەر بارانێکی بینی لەهەموو لایەکەوە دەباری و هەمووشتێ رادەماڵێ و دارهەڵدەکەنێ فتنەو تیاچوون لەو شوێنەدا روودەدات لەلایەن دەستەلاتدارەوە.

*دەگونجێت باران لەماڵێکدا بەتایبەتی نەخۆشیو دەردو بەلاو ئاولەبێت لەو شوێنەدا.

*ئەگەر زەوی خوێنی لێهەڵقولا سزایە، بەهەمان شێوە بارانیش هەروایە، ئەگەر بارانەکە خوێنبوو یان خاك و خۆڵ زوڵم و ستەمە لەدەستەلاتدارەوە.

*ئەگەر جوتیارێك بارانی بینی مژدەو فەرپیتە بەدەستی دەهێنێت، هەروەها دەڵێن: ئەگەر بارانەکە خۆڵبوو بەبێ تەم ومژ فەرپیتە.

**بارانپۆش( مشەمای باران )**: (نابلسی) دەڵێت: ناوێکی باشە چونکە لەفراوانترین جل وبەرگە.

*بۆ بازرگان پیاهەڵدانەو ستایشە.

*ئەگەر لەلۆکەبوو لەخوار مشەماوەیە.

*ئەگەر لەئاوریشمبوو دنیایە بەبێ ئاین.

*ئەگەر لەکەتانبوو لەخوار لۆکەوەیە.

*ئەگەر بەتەنیا پۆشی هەژار دەکەوێت و پیاوێك دەبێت لەنێو خەڵکیدا بەپیاهەڵدان و باسی باشەو جوان خۆی دەردەخات.

**بارگیر( یەختە )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: بارگیر باپیری مرۆڤە، ئەوەی بارگیرەکەی ببینێ لەخۆڵدا خۆی دەگەوزێنێ یان لەنێو پشقلدا باپیرەی بەرزدەبێتەوەو ماڵ و سامانی گەشە دەکات.

*هەروەها دەڵێن: بارگیر بەڵگەیە لەسەر:

+خزمەتکارو بەردەست.

+باپیرو بەخت و رزق و رۆزی.

+ولاخێکی مامناوەندی لەنێوان ئەسپ و گوێدرێژدا (هێستر).

*بارگیری زەرد خەم و پەژارەیەو ئەوەی کەوا راهاتووە لەسەر سواری ئەسپ سواری بارگیر بێت پلەوپایەی

دادەبەزێ لەلای فەرمانڕەواو لەژنەکەی جیادەبێتەوەو دەستدەداتە رەوشتنزمی.

*ئەوەی سروشتی خۆی وابێت سواری گوێدرێژبێتو لەخەودا ببینێ سواری بارگیر دەبێت پلەوپایەو ناونیشانی زۆر دەبێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرگیری بەئافرەتێکی خانەدان.

*ئەوەی ببینێ بارگیرێك مل ملانێی لەگەڵدەکاتو ناتوانێ جێگیربێت ژنەکەی زاڵدەبێت بەسەریا.

*ئەوەی بارگیر وتوێژی لەگەڵ بکات ماڵو داراییەکی مەزن لەلایەن ژنەکەیەوە بەدەست دەهێنێتو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوە.

*ئەگەر بینی بارگیرێ دەهێنێت چاکەیەك لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆیدا دەکاتو ئەویش سوپاس گوزار نابێت.

*سواربوونی بارگیریش بەڵگەیە لەسەر سەفەر.

*ئەوەی ببینێ بەسواری پشتی بارگیرێکەوەیە سەفەرێکی دوور دەکەوێتە بەرێو خێروچاکە لەرێگەی ژنەکەیەوە پێی دەگات.

*ونبوونو بزربوونی بارگیریش بەڵگەیە لەسەر خراپەی ژنو داوێنپیسی.

*ئەوەی سەگێك ببینێ بازدەدات بەسەر بارگیرێکدا دوژمنێکی ئاگرپەرست دوای ژنەکەی دەکەوێت، هەروەها ئەگەر مەیمونێك بازیدا بەسەر بارگیرێکدا جوولەکەیەك شوێنی ژنەکەی دەکەوێت.

*بارگیری رەشبۆر دەستەڵاتو فەرمانڕەواییە، هی رەشیش ماڵو دارایی بەرزو شکۆدارە، ئەوەی ببینێ بارگیرێکی نادیار دێتە شارەکەی پیاوێکی عەجەمی دێتە ئەوشارەوە ، بەچکەی مێینەی بارگیریش وەك ماین وایە.

*هەروەها دەگێڕنەوە ژنێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم دووپیاو هاتن بۆلامو یەکێکیان بەسواری بارگیرێکی رەشو ئەویتر بەسواری بارگیرێکی رەشبۆرەوە، پیاوی سوارەی بارگیرە رەشەکە دارێکی بەدەستەوەبوو کردی بەسکما (ئیبن سیرین) وتی: لەخوا بترسەو ئاگات لەوەبێت کەبەسواری رەشەکەوە بوو، کەچێکیش ژنەکە چوە دەرەوە پیاوێك لەئامادەبووان لای (ئیبن سیرین) دوایکەوت بینی دەچێتە نێوماڵێك ژنێکی تێدایەو ئەو ژنە هەڵدەستێت بەتاوانبارکردنی سوارەی

سەربارگیرە رەشەکە ، (ئیبن سیرین)یش کاتێ ژنەکە رۆیی وتی: ئایا دەزانن سوارەی بارگیری رەش کێیە ؟ وتیان: نەخێر ، وتی: فلانەکەسی نووسەرەو، سوارەی بارگیری رەشبۆریش فلانەکەسی...

(نابلسی) دەڵێت: بارگیر لەخەودا باپیری مرۆڤەو هەوڵوکۆششیەتی. بارگیری گەورەش باشترە لەکاروباری دنیادا، ئەوەی ببینێ بارگیرەکەی نوقم بوە لەئاودا دەمرێت یان بەلاو نەهامەتی رووی تێدەکات.

*ئەوەی ببینێ بوە بەخاوەنی بارگیرێك دەبێت بەخاوەنی ژنێك.

*ئەوەی ببینێ خاوەنی بارگیرە یان بەستویەتیەوە دەبێت بەخاوەنی خزمەتکار.

*هەروەها دەڵێن: بارگیر بەڵگەیە لەسەر گیروگرفتو ناکۆکی یاخود دەڵێن بارگیر بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی عەجەمی.

*ئەوەی ببینێ سواری بارگیرێکی ملکەچو رامبوەو زۆر تیژو خێرایە خێرو خۆشی رووی تێدەکات.

**بارمتە :** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی تورەکەیەکی لای پیاوێك دانا نهێنی خۆی لەلای داناوە.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر نهێنی کەوا بارمتەدانەر ئاگاداری نهێنییەك دەبێ ئەگەر بارمتەکەی لای مردوویەك دانا نهێنی خۆی لای یەکێك دادەنێ کەوا پارێزگاری لێدەکات.

*دەگونجێت بارمتەکە بفەوتێ بەهەمان شێوە ئەگەر بارمتەکەی لای ئاژەڵ دانا.

*ئەگەر بارمتەکەی لای یەکێك دانا شایستە نەبوو وەك دانانی بارمتە لای یەکێك کەلەخوار خۆیەوەبێت ئەوە بەڵگەیە لەسەر دانانی نهێنیو بڵاوبوونەوەی.

*بارمتە بەڵگەیە لەسەر تورەبوونی بارمتەدانەر، ئەگەر بینی شتێکی لای مرۆڤێك دانا زاڵدەبێت بەسەریا چونکە داوایدەکات.

*ئەگەر بینی شتێکی لای ژنەکەی داناو پاراستی دووگیاندەبێت لێی ، ئەگەر گەڕاندیەوە بۆی یاخود گوفتارێکی نهێنی لەگەڵ ئەنجامداو باسیکرد منداڵەکەی جێگیر نابێت.

**بارو کۆڵی مرۆڤ:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بارو کۆڵ لەخەودا قورسبوو بەڵگەیە لەسەر دراوسێی خراپ، دەگونجێت گوناهو تاوان بێت.

*کوڵوباری قورس بۆ ژن دووگیانییە یان مێردێکی خراپو شەڕەنگێزە.
*ئەگەر بینی کوڵو بارێکی قورس هەڵدەگرێ ئێشو زیانێکە لەدراوسێکەیەوە پێیدەگات.
*کوڵو بارهەڵگرتن بەسەر گەردن یاخود پشتەوە گوناهو تاوانە.
*کوڵو بار بۆ منداڵێك تازە لەدایك ببێت پشوودانە بۆئەوەی هەڵیدەگرێو ماندوویەتیە.
*ئەگەر بینی دارو چیلکەی هەڵگرتوە غەیبەتو دووزمانیو درۆ گواستنەوە پیشەو رەوشتێتی.
**بارەبەر( کۆڵهەڵگر )**: (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هەڵگرتنی گوناهو تاوان یان گۆڕینی سیفەتیو بینینی نەخۆشو چاکیو سەلامەتییە.
**باز( هەڵۆ )**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: باز پادشایە سەربڕینی مردنی پادشاکەیە، ئەوەی گۆشتی بازبخوات دەستەڵات بەدەستدەهێنێت.
*هەروەها دەڵێن: کوڕی نۆبەرەیە، یا دزێکە بەئاشکرا دزیدەکات، بینینی باز لەماڵدا بەڵگەیە لەسەر دەستگیرکردنی دزو جەردە.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر پیاوێك بازێکی بینی گوێڕایەڵو دەستەمۆو رامە بۆی ئەگەر شایستەی دەستەڵاتبوو دەستەڵات بەدەست دەهێنێت بەزۆرو ستەم، ئەگەر بازاڕیبوو شادیو دڵخۆشیو ناوبانگی باش بەدەست دەهێنێت.
*ئەگەر پادشا بینی بازێك بەدەستیەوەیەتیو هەڵفڕیو پەڕێکی بەدەستیەوە مایەوە موڵكو دەستەڵاتەکەی بەسەردەچێتو بەئەندازەی ئەو تاڵەپەڕە ماڵو دارایی بەدەستەوە دەمێنێتەوە.
*دەگێڕنەوە پیاوێك قورئانەکەی دەدزنو ئەویش دزەکە دەناسێت، پاشان لەخەودا دەبینێ وەك ئەوەی بازێکی راوکردبێت بەدەستەوە گرتبێتی، کاتێ بەئاگادێت دزەکە دەگرێتو قورئانەکەی لێدەسێنێتەوە.
*پیاوێك دێت بۆلای خەولێکدەرەوەیەكو دەڵێت: لەخەودا بینیم وەك ئەوەی بازێکی سپی بگرمو پاشان بازەکەبوو بەقالونچە، خەولێکدەرەوەکەش لێی پرسی: هاوسەرداری؟ وتی: بەڵێ ، پاشان وتی: لەهاوسەرەکەت کوڕێکت دەبێت ، پیاوەکە وتی: ئاخر بازەکە هەڵفڕیو

قالۆنچەیەك بەجێما؟ خەولێكدەرەوەكە وتی: گۆڕان تێكەڵو پێكەڵییە.
(نابلسی) دەڵێت: باز پیاوێكی خاوەن پلەوپایەو بەناوبانگو ستەمكارە، ئەوەشی بیگرێت كوڕێكی گەورەو پایەداری دەبێت، ئەگەر خۆشی شایستەی دەستەڵاتبوو بەدەستی دەهێنێت، ئەگەر بازەكە بەدەستیەوە هەڵفڕیو پەڕێكی مایەوە ماڵەكەی لەدەستدەچێتو بەتەنیا ناوبانگی دەمێنێت، ئەگەر تاڵە پەڕێك بەدەستیەوە مایەوە پشكێك مافی بەدەستەڵاتەوە دەمێنێت.
*ئەگەر بینی بازێك لەشوێنی خۆی چوە دەرەوە هاوەڵایەتی پیاوێكدەكات حەرامخۆرە یان پیاوێكی نەرمو نیان.
*بازیش بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەو دەستەڵاتو سەركەوتن بەسەر دوژمنداو، بەدەستهێنانی هیواو ئاواتو خۆدەرخستن بەماڵو منداڵ یان ماڵوداراییی دەگمەن لەگەڵ تەندروستیو لەش ساغیو ڕەواندنەوەی غەمو پەژارە یان زۆر سەفەركردن.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مردنو روح دەرچوون.
*بەڵگەیە لەسەر زیندانیو كۆتو بەندو ڕەزەیلیو دەستگرتنەوە لەخواردنو خواردنەوە.

*ئەوەی ببینێ بازەكەی فڕی دەستەڵاتو پۆستی فەرمانڕەوایی لەدەستدەدات، ئەگەر تاڵێك لەپەڕی بازەكە بەدەستیەوە مایەوە دەستەڵاتەكەی بەسەردەچێتو ماڵو داراییەكەشی بەئەندازەی ئەو پەڕە دەمێنێت.
*ئەوەی ببینێ بازێك دەكڕێت یان ڕاویدەكات لەسەر كارێك دەبێت كرێكارو كرێگرتەی دیكە دەخاتەسەر ئیشو دەستكەوتو سوودو قازانجی پێدەگەیەنن.
*مردنی بازیش بەڵگەیە لەسەر مردنی پادشا.
*(دمیری) دەڵێت: باز بۆ پیاوی بازاڕیی پلەوپایەو دەستەڵاتەو لەشوێنی خۆشیدا دزە یان وەچەی نێرینەیە.
(ئیبن سیرین)دەڵێت: باز بەڵگەیە لەسەر دووشت یەكەم:دەستەڵاتدارێكی ڕێزداری ستەمكاری بەناوبانگ. دووەم: كوڕێكی پلەوپایەدارە، ئەوەشی بازێكی بینی شوێنیكەوت پیاوێكی ئازا تورەبوە لێی.
(نابلسی)دەڵێت: باز بەڵگەیە لەسەر پیاوێكی ستەمكاری بەهێزو چەكمەدار.

*ئەگەر بازێکی بینی بێ گێرمەوکێشمە گەنج و دەستکەوت بەدەستدەهێنێت، هەروەها هەموو ئاژەڵێك گەر راوبکرێ بۆ راو دەستکەوتە.

*ئەگەر بازێکی راوکەری پێکا یان رام و گوێڕایەڵبوو بۆی دەسەڵات بەدەستدەهێنێت و ستەمکارو بەد ئاین دەبێ.

*ئەگەر بینی بازێکی راونەکەری پێکاو بەگوێی نەدەکرد کوڕێکی دەبێت گەورەدەبێت و دەبێ بەپیاو.

*باز بەڵگەیە لەسەر مەزنی و شکۆو سەرکەوتن بەسەر دوژمنداو گەیشتن بەهیواو خۆشیەکانی و ماڵ و دارایی و لەشساغی و خاڵیبوونەوەی غەم و پەژارە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+مەرگ.

+زیندان.

+کۆت و بەند.

+رژدی لەخواردن و خواردنەوەدا.

*باز سەبارەت بەکەسێکی گێل و کەودەن رەوانبێژییە لەنێو خەڵکیدا.

(دمیری) دەڵێت: پیاوێکهات بۆ لای (ئیبن سیرین) و وتی: لەخەودا بینیم کۆترێك دابەزییە نزیك پەنجەرەکانی کۆشك و بازێکهات و قووتیدا، (ئیبن سیرین) وتی: ئەگەر خەوەکەت راستبێ ئەوە (حەجاج) کچی (طیار) دەهێنێ، پاشان لێکدانەوەی خەوەکە بەوچەشنەبوو کەبۆیی لێکدایەوە.

**بازاڕ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بازاڕ بەڵگەیە لەسەر مزگەوت هەروەك چۆن مزگەوت بەڵگەیە لەسەر بازاڕ چونکە هەردووکیان بازرگانی و سوودی تیا دەبینرێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گۆڕەپان و مەیدانی جەنگ کەوا کۆمەڵێك تێیدا دەبیاتەوەو کۆمەڵێکیتر تیایدا دەدۆڕێ و خوداوەند جیهادی بەبازرگانی ناوزەدکردوەو دەفەرموێت: ﴿ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَارَةٍ تُنجِيكُم ﴾ (الصف: ١٠).

*خەڵکی بازاڕ لەگەڵ یەکدا دەجەنگن بەنەفس و ماڵیان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شوێنێك پاداشتیان تیا دەستبکەوێت وەك شوێنی زانیاری و زاڵگەی چاودێری و کێوی (عەرەفە) لە(حەج)دا یا ئامادەبوونی (حەج).

*بازاڕی گۆشتفرۆش وەك شوێنی جەنگ وایە چونکە خوێنی تیا دەرژێت و ئاسنی تێدایە.

*بازاڕی کانزاکان وەك ئەڵقەی یادوزیکرو زانیاری وایە.

* بـازاڕی پارەگۆڕینــەوە وەك لانــەی هەراو تەگبیروڕا وایە.
* ئەگــەر خــۆی لــەبازاڕێکی نادیـار بینیـەوە مامەڵەیـەکی تێدا لەکیسچوو یـــاخود لەمامەڵەیەکـــدا ســـوودو قـــازانجیکرد ئەگـــەر لەبێداریـــدا لەتێکۆشـــانو جیهـــادابوو شـــەهیدی لەکیسدەچیو پشتهەڵدەکات.
* ئەگەر لە(حەج)دابوو لەکیسیدەچێت یاخود لێیدەشێوێت.
* ئەگـەر خوێنـدکاربوو لێیتیـچکدەچێ یاخود لەکیسیدەچێت یان داواکـەی بـۆ خوداوەند نییە، ئەگـەر هیچکام لەوانە نــەبوو نوێـژی بەکۆمـەڵی لەمزگـەوت لەکیسدەچێت.
* ئەگـەر دزیکـرد لـەکڕینو فرۆشـتندا ئەگـەر تێکۆشـەربوو ناپـاکی دەنـوێنێ ئەگــەر حــاجیبوو ڕاودەکــات یــاخود جووتدەبێ لەگەڵ هاوسەرەکەی، ئەگەر زانــابوو لەمــشتومڕدا ســتەمدەکاتو لەفەتواکانیشیدا ناپاکدەبێت.
* ئەگەر بازاڕی بەئاوەدانی بینی یاخود بینی ئاگری تێبەربوە یـا ئـاوێکی ڕوون بەنێوەڕاسـتیدا تێپـەڕدەبوو یـاخود کـا لەدوکانەکاندا هەڵچنرابوو یـان بـۆنێکی خــۆش لێــوەی هــەڵیکردبوو بــژێوی خەڵکی دەبوژێتەوەو سوودو قازانجیـان دەستدەکەوێتو دووڕوویـی بەنێویانـدا بڵاودەبێتەوە.
* ئەگـەر خـەڵکی بـازاڕی بەخـەواڵوویی بینیو فرۆشگاو دوکانەکانیان داخرابوو یـاخود وەك جاڵجاڵۆکـە تـۆڕی خـۆی بـەدەمی دوکانەکانـدا هەڵـدابوو یـان بەسـەر ئـەو شـتانەدا کەدەیانفرۆشـت ئەوە بازاڕساردی ڕوویان تێدەکات.
* ئەگـەر بینـی بـازاڕی پیشەوەرەکان گۆڕابــوو بــۆ نموونــە بــازاڕی زێــڕ قەسـابەکانی تێـدابینی ئـەوە سـوودو قـازانجی زەڕەنگـەرەکان زیاددەکـات، ئەگـــەر لـــەبازاڕی زەڕەنگەرەکانـــدا شووشـــەو گلێنـــە فرۆشـــەکانی بینـــی ســـوودو قـــازانجو کاروکاســـبیان لاوازو سست دەبێت.
* هەندێکـــدەڵێن: بـــازاڕ دنیایـــەو فراوانبوونی بازاڕ فراوانبوونی دنیایە.
* هەروەها دەڵێن: بازاڕ بەڵگەیە لەسەر پێکـــدادانو دەنگـــەدەنگ بـــەهۆی کۆبوونـــەوەی خـــەڵکی گـشتی تێیـــدا، بـەڵام ئـەوەی لـەبازاڕ دەژی بەڵگـەی خێـرە ئەگـەر خـەڵکێکی زۆری تیـابینی یـاخود بەسـەرقاڵی بـەدیکردن، بـەڵام ئەگـەر بـازاڕ هێوربـوو بەڵگەیـە لەسـەر بێکاریی بازاڕییەکان.

(نابلسی) دەڵێت: بازاڕ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:
+رزق و رۆزیو سوودو قازانج.
+جلوبەرگی نوێ.
+چاکبوونەوە لەنەخۆشی.
+درۆو خراپەو غەمو پەژارەو بۆڵە بۆڵ.
+حەمام(گەرماو)و شوێنی خۆشتن.
+هەموو شوێنێکی کۆبوونەوەی خەڵکی وەك مزگەوتو کەنیسە.
+دەریا چونکە هەموو جۆرە ماسییەکی تێدایەو یەکدی دەخۆن.
+درزی رووپاو زەوییەك.
*بۆخەڵکی لێپرسراو بەڵگەیە لەسەر کەوتنەکاری یاساغکراوو رووبە دنیاچوون.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆبەکەمزانینو دەروونشکان بەتایبەت ئەگەر لەخەوەکەیدا شتێکی هەڵگرتبوو.
*ئەگەر لەبازاڕدا یادی خوایکردەوەو دەنگی بەرز کردەوە بەڵگەیە لەسەر فەرمانبەچاکەو رێگری لەخراپە.
*ئەگەر بازاڕی بەچۆڵی بەدیکرد یاخود خەڵکەکەی مردبوون بەڵگەیە لەسەر خراپیو ستەم.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەرزبوونەوەی نرخ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو خەرجییە پێویستانەی دەبێت بیکات وەك خەرجی هاوسەرگیری یاخود منداڵی نوێبوون یان زانیاری ، یا کارکردن لەپیشەیەکدا یاخود داوای حەجو زەکاتو جیهادو تێکۆشان لەپێناوی خواداو ئەنجامدانی شەونوێژو کڕینو فرۆشتنو سلفەو رەهنکردن.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+کتێبو ئامۆژگاری.
+خوێندنەوە.
+دانایی.
+پلەوپایەو گاڵتەو گەپ.
+هەڵە لەمۆچیاریو ئامۆژگاریدا.
*هەموو بازاڕێك لێکدانەوەیەکی تایبەتی هەیە:
+<u>بازاڕی کتێب</u>: بەڵگەیە لەسەر رێنومایی و تەوبەو حکومەتو شەڕو مشتومڕ.
+<u>بازاڕی دەرمانخانەکان</u>: چاکبوونەوەیە لەنەخۆشی بۆیەکێك نەخۆشبێت.
+<u>بازاڕی بۆنی خۆش</u>: هەواڵی خۆشو هاوسەرو منداڵە.
+<u>بازاڕی شیرینی</u>: بەڵگەیە لەسەر باوەڕو ئیسلام.

+بازاڕی زەرەنگەرەکان: پلەوپایەی بەرزونوێکردنەوەی ژنهێنانە لەگەڵ رزق و رۆزی و شاردنەوەی کاروبارەکان.

+بازاڕی رووکەشکاران: بەڵگەیە لەسەر شایی و جوانکاری و هاوسەرو منداڵە.

+بازاڕی مس: بەڵگەیە لەسەر شەڕو خراپەو بۆڵە بۆڵ لەگەڵ شکانی سەرو هاوسەرگیری بۆ کەسێکی رەبەن و شایی و خۆشی.

+بازاڕی چەك: بەڵگەیە لەسەر جەنگ و مشتومڕو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا.

+بازاڕی کۆیلەفرۆشەکان: پلەوپایەی مەزن و ئاگاداربوونی هەواڵی سەیرو سەمەرەیە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئاژەڵ.

+بازاڕی خوری و پێستە: بەڵگەیە لەسەر رزق و رۆزی و سوودو قازانج و ماڵی میراتی.

+بازاڕی لۆکە: بەڵگەیە لەسەر ژیانەوەی رزق و رۆزی و دەرکەوتنی حەق و بەسەر ناحەقدا.

+بازاڕی ئاوریشم: وەچەو سوودو قازانجە لەکشتوکاڵدا.

+بازاڕی سەوزە: بەڵگەیە لەسەر رژدی و ناخۆشی ژیان، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئاسانبونی کاری قورس وگران.

+بازاڕی ماسی فرۆشەکان: رزق و رۆزی و سوودو قازانجی یەك لەدوای یەکەو کۆبوونەوەیە لەگەڵ خزم و کەسوکارو هەواڵی سەفەری دەریابیە.

+بازاڕی رۆن و زەیت و هەنگوین: بەڵگەیە لەسەر هەڵسانی حەزو ئارەزوو چاکبوونەوەی نەخۆش.

+بازاڕی قەساب وکوشتارکاران: غەم و پەژارەیە.

+بازاڕی کۆنە: سەفەرە بەدەریادا.

+بازاڕی زین و کۆپان: سەفەرکردنە بەوشکانیدا.

+بازاڕی میوە: کرداری چاکە لەگەڵ زانیاری و منداڵدا.

+بازاڕی کۆفرۆشانی کاڵاوشتومەك: شایی و خۆشییە دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ناکۆکی لەگەڵ عەجەمییەکان.

+بازاڕی موڵك فرۆشان: پاراستنی ماڵ و سامانە لەگەڵ پاراستنی نهێنی.

+بازاڕی گەنم و دانەوێڵە: خۆشی و ئاسایش و دڵنیاییە لەترس وبیم.

**+بازاڕی دارفرۆشان:** دووڕوویی‌و پەرتبوونی کۆبوونەوەی کۆمەڵێکە.

**+بازاڕی ئاسنگەران:** شەڕو خراپەو ئاژاوەو ناڕەحەتی‌و پلانە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رزق‌و رۆزی‌و سوودو قازانج.

**+بازاڕی ئاوریشم فرۆشان:** مەزنی‌و شکۆمەندی‌و ماڵ‌و دارایی‌و کرداری باشە.

**+بازاڕی مۆم فرۆشان:** بەڵگەیە لەسەر تەوبەکردن بۆ سەرپێچکارو رێنمویی کەسی خراپ‌و سەرگەردانە.

**+بازاڕی بابەتی شووشە:** سەفەرەو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بازاڕی ئاژەڵفرۆشان.

**+بازاڕی چادر فرۆشان:** بەڵگەیە لەسەر سەفەر ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کفن بۆ مردوو.

**+بازاڕی نان و کولێرەفرۆشان:** غەم‌و پەژارەو نەخۆشییە لەگەڵ شەڕو ئاژاوە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بازاڕی دیاروبەرچاو.

**+بازاڕی سندووقفرۆشان:** بەڵگەیە لەسەر پاراستن‌و تێگەیشتن‌و بێداری.

**+بازاڕی چێشتخانەکان:** بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوە لەنەخۆشی‌و بەدەستهێنانی پێداویستی.

**+بازاڕی شووشەو فەخفوری:** بەڵگەیە لەسەر رووپامایی‌و دووڕوویی‌و قسەهێنان‌و قسەبردن (فیتنەیی).

**+بازاڕی کاغەزو کاروباری پەڕاوگە:** بەڵگەیە لەسەر زێرو دادگای‌و سەرکەوتنی ستەملێکراوو تۆڵەسەندنەوە لەستەمکار.

*بازاڕ بۆ دادوەر وەزیرو فەرمانڕەوایان باشە.

**بازدان:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر گواستنەوەی لەحاڵی خۆیەوە بۆ حالێکیتر. یان لەبازاڕێکەوە بۆ یەکێکی دی یان لەگەڕەکێکەوە بۆ گەڕەکێکیتر یا لەکارێکەوە بۆ کارو فرمانێکیتر.

*ئەگەر لەمزگەوتەوە بازیدا بۆ بازاڕ سووکی‌و نزمی خستوەتە پێش قیامەت، ئەگەر لەبازاڕەوە بۆ مزگەوتبوو پێچەوانەی ئەوەیە.

*ئەگەر لەشوێنێکەوە چوو بۆ شوێنێکیتر لەحاڵێکەوە دەچێت بۆ حاڵێکیترو بازی دوور سەفەرێکی دوورودرێژە، ئەگەر لەبازەکەیدا خۆیدا بەسەر گۆچانێکدا پشت بەپیاوێك دەبەستێ.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی لەزەوی بازیداو روو بەئاسمان بەرزبوەوە مردن‌و هەڵگرتنی تەرمەکەیەتی.

*ئەگەر بینی لەبازدانەکەیدا بەویستی خۆی هەڵسوکەوتدەکاتو بازەکەی دەگات بەو جێگەیەی کەوا خۆی دەیەوێت توانای گواستنەوەیەتی لەحاڵێکەوە بۆ حاڵێکیتر.

*ئەگەر بازیدا بەسەر بیرو چاڵو روبارێکدا لەحاڵێکەوە دەچێت بۆ حاڵێکیترو لەکارێکی خراپ قوتارو پارێزراو دەبێت.

*ئەگەر مرۆڤێکی بینی بازدەدات بەسەریا دەدۆڕیو شکستدەهێنێ.

(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بازیدا بۆ پیاوێك زاڵدەبێت بەسەریا چونکە بازدان بەڵگەیە لەسەر هێزی مرۆڤ.

*ئەگەر بینی لەسەرزەوی بازیدا هەتا گەیشتە ئاسمان سەفەردەکات تا دەچێتە (مەککە).

*ئەگەر بینی بەرێکی دەڕوات بەڕێوە خوازیارو داواخوازی شەریعەتەکانی ئیسلامەو رزقو رۆزی خێر دەدرێت.

*ئەگەر بینی بەبازاڕدا دەڕوات بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئامۆژگارییەك لەدەستیدایە، ئەگەر شایستەی ئامۆژگارییبوو بەدەستی دەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿مَالِهَٰذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الأَسْوَاقِ﴾ (الفرقان:٧).

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی چەندبازێك دەدات لەسەر زەوی بەیەك قاچ دەگونجێت نەتوانێ بڕوات پێوەیو بەلاو نەهامەتی رووی تێدەکاتو نیوەی ماڵو سامانەکەی دەڕوات بەوەی دی دەژی لەماندووبوونو هیلاکیدا.

(نابلسی) دەڵێت: بازدان بەیەك قاچ لەخەودا گواستنەوەیە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر ، ئەگەر بازدانەکە درێژبوو سەفەر دەکات.

*ئەگەر بینی بازدەدات بەسەر تۆپێکداو بەچەقۆ یاریدەکات خێرە بۆیەکێك راهاتبێ لەسەری، ئەگەر رانەهاتبوو لەسەری دەکەوێتە بەلاو نەهامەتییەکی مەزنەوە.

**بازرگان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر یەکێك بینی لەسەر فرۆشگەو دوکانێك دانیشتوەو لەدەوربەریدا شتومەکی بازرگانی داناوەو جلوبەرگی ئەوانیشی پۆشیوەو بازرگانیدەکات سەرۆکایەتیو پێشەنگییە ، ئەگەر بازرگانەکە گەورە بازرگان نەبوو شتومەكو کالای بازرگانی بەدەستیەوە بینی دڵنیا دەبێت لەهەژاریو کەمدەستی.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی بازرگانان لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجو

پلەوپایەی بەرزو سەفەرو بیستنی هەواڵو دەنگوباسی سەیرو سەرنجراکێش.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کەمتەرخەمی لەوەی پەروەردگار بەپێویستی گێڕاوە وەك(حەج)وجیهادو تێکۆشانو ڕۆژوو نوێژی هەینی.

*ئەگەر ژن لەخەودا بوو بەبازرگان لەفرۆشگاو دوکانێکدا بەپێی ئەو بازاڕەی تێدا دانیشتوون لێکدانەوەی خەوەکە دەگۆڕێ ، ئەگەر لەبازاڕی چەكو بابەتی جەنگدابوون بەڵگەیە لەسەر جموجوولّی دوژمنو دەستبەسەراگرتنی وڵاتانی ژێردەستەڵاتی ئیسلام لەلایەن ئەوانەوە.

ئەگەر لەبازاڕی ئالّتوونو کەلوپەلی داڕێژراوی کانزاییدابوون بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجو دەستکەوت.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە کاروبار دەڕازێنێتەوە بۆ هەریەکێك تێکەڵی ببێت بەمەرجێك نرخو بەها وەرنەگرێ.

*دەگونجێت هاوڕێکەی کارێکی نابەجێی لەگەڵدا ئەنجام بدات ئەویش غەمو پەژارە بیگرێ.

**بازرگانی گرانی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەو بازرگانەی شتومەك هەڵدەگرێ بۆ گرانی لەخەودا پیاوێکی متمانەدارەو خەڵکی ئەسپەردەی ئەمانەتی لادەکەن.

**بازرگانی کاڵاوشتومەك:** (نابلسی) دەڵێت: بازرگانی کاڵاوشتومەك لەخەودا پیاوێکی لەخۆبایی دنیاپەرستەو ماڵوداراییی کۆدەکاتەوە، بازرگانی بابەتی شیرەمەنیش پیاوێکە خوازیاری زانیارییەو گەشتوگوزار دەکاتو زانیاری وەردەگرێو ئاینی زیاددەکات.

*بازرگانی ولاخو ئاژەڵ پیاوێکی بێخێرە، ئەگەر مەڕی نەهێناو کەوت بەسەر دزدا بەڵگەیە لەسەر ئاینو بەدەستەڵاتێکی ستەمکار لێکدەدرێتەوەو خراپەدەکات بەرانبەر کۆمەڵێك، ئەگەر بەویستی خۆی مەڕی هێنا پیاوێکی ماڵوداراییی کۆکەرەوەیە، بازرگانی ڕەشەوڵاخیش داواکاری کرێکارانە.

*بازرگانی مەڕ پیاوێکی شکۆمەندو ناوبانگباشە ماڵوداراییی حەڵاڵو زانیاری کۆدەکاتەوە.

**بازرگـانی کەل‌وپـەل (شـتومەك):**
(ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: بازرگـانی کەل‌وپەل دنیا کۆدەکاتەوە.

**بـازن(دەسـتەوانە):** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: ئەگـەر پیـاو بـەدیبکات دەسـتکورتییەتی، ئەگـەر لـەزیوبوو پیاوچـاکێکە هەوڵـدەدات لـەکاروباری چاکەدا بەپێی ئایەتی: ﴿وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِنْ فِضَّةٍ﴾.

*ئەگـەر دوژمنـداربوو خوداوەنـد پشتگیریدەکات.

*ئەگەر چەن بازنێکی زێری لەدەستیدا ببینێ دەستی نوقاودەبێت.

*ئەگـەر پادشـاو سـەرکردەیەك بـازنی ژێردەسـتەکانی خـۆی بینـی نـەرمو نیاندەبێت لەگەڵیان‌و دادپەروەر دەبێت بۆیـان‌و دەسـتکەوت‌و بـژێوی‌و فـەریان دەسـتکەوتێت‌و دەسـتەڵاتەکەی دەمێنێتەوە.

*هەروەها دەڵێن: بـازنی زیـو بەڵگەیە لەسـەر خزمـەتکار، یـان مـاڵ‌و دارایـی زیادەیە.

(نابلـسی) دەڵێـت: بـازن کـوڕەو، پەیوەندییە بەسەربردنی خزماتیەتیە، بـازن خزمـەتکارە، بـۆ ژنـیش نـازو نیعمەت‌و خۆشحاڵییە.

*بـازن غـەم‌و پەژارەیـە بـۆ ئـەو ژنـەی لەدەسـتیکردوەو بـۆ پیـاوانیش غـەم‌و پەژارەیە.

*ئەگەر بازنی بەدەستی مردوەکانـەوە بینی لەبەهەشتدان.

*هـەروەها دەڵـێن: بـازنی ئـاڵتوون میراتییـە بـۆ یـەکێك لەدەسـتیبکات لەخەودا.

*بازن ژنە بۆ کەسێکی رەبـەن‌و بـەکوڕ لێکدەدرێتەوە.

*بازنی زیو ئاین‌و خواناسییە بۆ یەکێك لەخەودا لەدەستیبکات چونکە لەخشڵی بەهەشتییەکانە.

*بازن ئەگەر لەزێڕ یا زیوبـوو رێـزداری ماڵ‌وسـامان‌و جوانییـە ، خۆئەگـەر لەئێسقان یا شفرەی فیلبوو دەگونجێت بەڵگـەبێت لەسـەر خزمـەتکار یـان کەسانی سووك‌و رسوا.

*دەگونجێـت لەدەسـتکردنی بـازن بـۆ پیـاو بەڵگـەبێت لەسـەر موڵـك یـان دەرچوون لەحەق بۆ ناحەق‌و درۆ.

*دەگونجێـت بـازن بەڵگـەبێت لەسـەر ئاهو حەسرەت‌و پەشیمانی.

*دەگونجێت بەڵگـەبێت لەسـەر ئـەوەی لەشارو وڵاتێکدا روودەدات یان دەچێتە نێوی یان لێی دەردەچێت.

**بـازوو:** (ئـيبن سـيرين) دەڵـێت: بـازوو برايە، ئەگەر زيادەيەكى لەبازوويدابينى چـاكبوونى كاروبـارى براكەيـەتى يـان كوڕى باڵغى.

*ئەگەر ناتەواوى لەبازوويدا بينى بـەڵاو نەهامەتى بەئەنـدازەى زيادوكـەم رووى تێدەكات.

*ئەگـــەر بينـــى بـــازووى ناتـــەواوەو خەوەكـــــەى بـــۆ راڤـــــەكارێكى خەوگێڕايـەوەو وتـى: كـەم ئـەقڵو زۆر نەش‌ونما دەكەيت.

(نابلسى) دەڵێت: ئەگـەر بينـى بـازووى شـكاوە مـەرگى خەوبينـەرە يـان بـەڵاو نەهامـــەتى‌و غـــەم‌و پـــەژارە رووى تێدەكات.

*بـازوو بەڵگەيـە لەسـەر پـشتگيرى لەئاين‌و دنياو هاوسەرو..

*ئەگەر بـازووى بەهێزوپتـەوبوو هێـزى هاوەڵەكەيەتى لەماڵ‌و دارايیدا.

*هێزى بازوو زيادەيە لەپيشەدا.

*هەروەها دەڵێن: بازوو كـوڕێكى باڵغـە پـــشتى بـــاوك‌و براكـــەى دەگرێـــت لەناڕەحەتيدا.

**بازى پادشـاو مـيران:** بينينـى لەخـەودا بەڵگەيـــە لەســـەر شـــەڕو كوشـــتار، هەروەها بينيى بەڵگەيە لەسەر كـەرت‌و پەرتكردنى شتى جەمبوو.

**باسكردن لە پاشەملە:** (نابلسى)دەڵێت: باسكردنى كەسانيتر لەخـەودا بەڵگەيـە لەسـەر تياچـوونى فـەرووپيت چـونكە باسكردنى پاشـەملە چاكە لـەناودەبات هەروەك چۆن ئاگر تەختەدەسوتێنێ.

*ئەگــەر بينـــى لەپاشـــەملە مرۆڤێـــك باسدەكات ئەگەر باسكردنەكە لـەبارەى هەژارييەوەبوو هەژارى بۆدەگەڕێتـەوە، ئەگـەر باسـى ئابڕوچـوونى بـوو ديسان ئابڕوچوون دەگەڕێتەوە بۆى.

*باســـكردنى پاشـــەملە زيانەكـــەى دەگەڕێتـــەوە بـــۆ باســـكار، ئەگـــەر غەيبەتى يـەكێكيكرد خـۆى بـەو بەڵايـە تووش‌و گيرۆدە دەبێ.

**باڵيبـــەربوون (تركەنـــدن):** (ئـــيبن سـيرين)دەڵێـت: ئەگـەر بينـى لـەنێو خەڵكدايـــەو بايـــەكى لێبـــەربووەوە بەبێنـــەوەى ويـــستى خـــۆى تێـــدابێ دەرووى لێدەكرێتەوە لەغـەم‌و پـەژارەو قوتاردەبێ.

ئەگەر بەويستى خۆى باى لێبەربووەوەو باكـــەى دەنگێكـــى گـــەورەى هـــەبوو بۆگـــەنى بـــــەرپاكرد قـــــسەيەكى ناقۆڵادەكات يان كردارێكى بەدو خراپ‌و بەخراپە باسيدەكەن بەپێى گـەورەيى‌و بـۆنى باكـەى، ئەگـەر بۆگـەنبوو بـەڵام كـپ‌و بێدەنگبوو پياهەڵدانێكى خراپـە بەپێى بۆگەنييەكەى.

*ئەگەر بای لێبەربوەوە لەنێو کۆمەڵێکدا ئەگەر لەغەمو پەژارەدابوون دەروویان لێدەکرێتەوە ، ئەگەر لەناڕەحەتیدابوون ئاسانیو خۆشی روویان تێدەکات.

*ئەگەر بەتوندی بای لێبەربوەوە زۆری لەخۆکردوە کارێکی ئەستەم ئەنجام بدات، ئەگەر بەئاسانی بای لێبەربوەوە کارێك لەئەندازەی توانای خۆیدا بەجێدەگەیەنێ.

(نابلسی) دەڵێت: بالێبەربوونەوە لەخەودا قسەیەکی خراپە یاخود رووداوێکە روو لەبالێدەر دەکات.

*بالێبەربوونەوە بەڵگەیە لەسەر جیابوونەوەی کاروباری کۆمەڵێكو بڵاوبوونەوەی هەواڵی ناخۆشو خورپاوی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+گێلی.

+دەستبەرداربوون لەسەرجەم خەڵکی.

+درۆو قسەی ناشیرین یاخود ئەو دەنگەی لەلێدانەوە بەرپادەبێت.

*ئەگەر بینی بایەکی لێبەربوەوەو دەنگی هەبوو قسەیەکی ناقۆڵادەکات.

*ئەگەر بایەکی لێبەربوەوە بەدوایدا بۆنهات شکۆمەندی لەسەفەرەوە دەستگیردەبێت، بەڵام کاروبارەکانی پەرت پەرت دەبنو پاشان غەمو پەژارەی دەڕەوێتەوەو بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە.

*بالێبەربوونەوە لەرێگەی زارەوە بەڵگەیە لەسەر پێهەڵخلیسکان لەقسەدا یاخود رووداوێك دێت بەسەر زاردا بەهۆی نەخۆشیەوە ناشیرینی دەکات، یاخود رەوشێکی خراپ لەکەداریدەکات.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی ببینێ بای لێبەربوەتەوە غەمو پەژارە رووی تێدەکات، ئەگەر لەنێو خەڵکیدابوو غەمو پەژارەیەکی بڵاودەکەوێتە نێوی.

*ئەگەر بینی کەسێکیتر بای لێبەربوەوەو ئەویش بۆنەکەی هەڵمژی غەمو پەژارەیەکە دێت بەسەریا.

*ئەگەر بینی لەنوێژدایەو بایەکی لێبەربوەوە بەڵام بۆنەکەی بۆگەن نەبوو داوایەکدەکاو خوداوەند دەرووی لێدەکاتەوە پاشان قسەو وتەیەك دەکات ملکەچیو رسوایی تێدایە ئەمەش قورسو ئەستەم دەبێت لەسەری.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا وتەی ناقۆڵایەو ملکەچی تێدایە بۆنەوەی باکەی لێبەربوەتەوە.

*ئەگەر بۆنی بای کەسێکی تریکرد غەمو پەژارە رووی تێدەکات.

*بالێبەربوون بەڵگەیە لەسەر:

+دەرخستنی نهێنی.
+ڕەواندنــەوەی ئــەوەی لەنێوناخدایــە لەناپاکیو ڕقو قین.
+پشوودان دوای ماندوبوون.
+قەرزدانەوە.
+سەرئێــــشەو لووتپـــژانو هـــەواڵی ناخۆشو دڵتەزێنە.
*ئەگــەر بینــی دوای دەســتنوێژ بــای لێبــەربوەوە ، ئەگـــەر باڵێـــدەربوو بەڵێنــدەداتو نایباتەســـەر مەگـــەر بگەڕێتەوە بۆ دەستنوێژگرتن ، ئـەوجا بـەڵێنو پـەیمانی دەباتەسـەر یـاخود کەفارەتی سوێندەکەی دەدات.
*ئەگـــەر بـــەبێ دەســـتنوێژ بـــای لێبـەربوەوە قـسەو وتەیەکـە دەیکـات یـاخود مـاڵو سـامانێکە هـیچ خێرێکـی تێدا نییە.
*ئەگەر لەماڵی خۆیدا بـای لێبـەربوەوە قــسەو وتــە لەگـــەڵ خانەوادەکـــەی دەکات، هەرکات بـۆنی بۆگـەنبێ زیـاتر بەڵگەیە لەسەر خراپی بۆچوونەکان.
**بـــاڵ:** (نابلـسی)دەڵێـت: پـەلو بـاڵ لەخەودا کوڕە، ئەوەی ببینـێ دووبـاڵی هەیە دوو کوڕی دەبێت ، باڵیش پـەڕەو پـەڕیش لەلێکدانـەوەدا مـاڵو دارایـیە، دەگونجێت پـەڕوباڵ مەیخواردنـەوەبێت چونکە دڵیەتی.

*دەگونجێت پەڕو باڵ بەڵگەبێت لەسەر پلەوپایەو دەستەڵات چونکە دەگوترێت فلانەکەس بەباڵی ڕفی.
*دەگونجێت بەڵگـەبێت لەسـەر ڕوەكو کشتوکاڵ.
*ئەگەربینی باڵی هەیـەو پێـی دەفڕێـت بـەڕێزو دەسـتەڵاتەوە سـەفەر دەکـات بەئەنـدازەی ئـەوەی لەسـەر زەویـدا جێگیربوە، ئەگەر نەیتوانی بەباڵ بفـڕێ خێرو چاکەیەك ڕووی تێدەکات.
*هەردوو باڵ ماڵو دارایی‌و دوو کوڕە ، ئـــەوەی بـــاڵی بـــشکێ کوڕەکـــەی نەخۆشـدەکەوێت ئەگــەر بـاڵی لــەبن دەربکێشرێ کوڕەکەی دەمرێت.
*باڵ ماڵو سەفەرە.
*دەگونجێت مـاڵیش برینداریـیەك بێـت ڕووبکاتە خەوبینەر.
*ئەگـەر باڵەکـە قـورس‌وگرانی کردبـوو نەیدەتوانی بفڕێت پێی گونـاهو تـاوانو سزایە.
**باڵندە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: باڵندەی ئـاو لەلێکدانـەوەدا باشـترین باڵندەیـە ئەوەی بیگـرێ یـان بەدەسـتی بهێنێـت مـــاڵو دەســـتکەوتێکی باشـــی بەدەستهێناوە بەپێی ئایـەتی: ﴿ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴾ (الواقعة: ٢١).

*باڵندە پیاوێکە خاوەنی تواناو چەك و هێزو خواردن و رفینە لەهەوادا.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم ژمارەیەکی زۆر باڵندەی ئاومگرت، یەك بەیەك سەرم دەبڕین، گوتی: ئەگەر نەچوویتەسەر ئاو کەسێکی بەرتیلخۆرت دێتە رێ.

*ئەگەر بینی باڵندە بەسەرسەریەوە دەفڕێت پلەوپایەو دەستەلات بەدەستدەهێنێ بەپێی ئایەتی: ﴿والطَّيرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَهُ أَوَّابٌ﴾ (ص:١٩).

*ئەگەر ژمارەیەکی زۆر باڵندەی بینی لەگەڕەکەکەیدا دەگونجێت فریشتەبێت.

*دەگێڕنەوە یەکێك لەغەزاکاران دەبینێ لەخەودا سەرتاشێك سەری بۆ دەتاشێ و لەدەمیەوە باڵندەیەکی سەوز دێتە دەرەوە و ڕوویەرئاسمان دەفڕێ و دیسان دەگەڕێتەو بۆ سکی پاشان ئایەتی: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾ (طه: ٥٥)دەخوێندەوە.

ئەم خەوە بۆ هاوەڵەکانی دەگێڕێتەوە ئنجا خۆی لێکیدەداتەوەو دەڵێ: سەرتاشینم لەگەردندانە، باڵندەش روحمە روو بەبەهەشت دەچێ، گەڕانەوەشم بۆ سکی دایکم زەوییە، دووەم رۆژی دوای بینینی خەوەکەی کوژرا.

*پیاوێك هات بۆ لای (ئیبن سیرین)و وتی: لەخەودا بینیم باڵندەیەك لەئاسمانەوە هات و خۆی خستە نێوان هەردوو دەستم ، ئەویش وتی: مژدەیەك رووت تێدەکات و پێی دڵخۆش دەبی.

*باڵندەی نادیار بەڵگەیە لەسەر فریشتەی مردن ئەگەر زیخ یا کاغەز یاخود کرمی هەڵگرتبوو فڕی بەرەو ئاسمان و لەماڵەکەدا نەخۆشی تیابوو نەخۆشەکە کۆچی دواییدەکات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەر بۆ یەکێك ببینیێ دەکەوێتەخوارەوە بەسەریا یان بەسەرشان و گەردن و کۆشدا بەپێی ئایەتی: ﴿ وَكُلَّ إنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ ﴾ (الإسراء: ١٣) واتە: کردارەکانی.

*ئەگەر سپیبوو بێگەردو سافە ، ئەگەر لیل و رەنگاو رەنگبوو کرداری ناروون و جیاوازە مەگەر ژنێکی دووگیانی هەبێت.

*ئەگەر باڵندەکە نێربوو کوڕدەبێت، ئەگەر مێینەبوو کچە، ئەگەر سەریبڕی دەژی و بۆیدەمێنێتەوە، ئەگەر فڕی کەمدەمێنێتەوە.

*ئەگـەر زەرنەقووتـە هـەڵیبگرێت یـان بئۆزێتـەوە کـورە، هـەموو بەچـکەیەکی تریش بەو شێوەیەیە.

*باڵنـدەی ناسـراو لێکدانـەوەی بـەپێی خۆیـەتی، باڵنـدەی گـەورەو درنـدەش بەڵگەیە لەسەر فەرمانڕەواو سـەرکردەو خـەڵکی زانـاو پلەوپایـەدارو بـژێوی پەیداکاو دەوڵەمەند.

*ئـەو باڵندانـەی مردارەوەبـوو دەخـۆن وەك قەلـەڕەش و سـوورەداڵ و..دزو جەردەو خراپەکارن.

*باڵندەی ئاو ڕێزدارانـە پلەوپایەیـەیان لەدوولاوە بەدەستهێناوەو لـەنێوان دوو دەسـتەلاتداردا هەڵـسوکەوتیانکردوە دەستەلاتداری ئاوو هەوا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوانـەی سـەفەر بەوشـکانی و ئـاودا دەکـەن، ئەگـەر خوێنـدیو دەنگـی لێهـات ئـەوە گریان و شیوەنە.

*ئـەو باڵندانـەی دەخـوێنن یـان دەنگێکیان لێوە دێت گۆرانی و شیوەنە گەر ئەو باڵندەیە نێربێت یان مێ.

*باڵندەی بچووك وەك چۆلەکەو بولبول منداڵی بچووکن.

*پۆلـە باڵندەیـەك بـۆ یـەکێك ببێـت بەخاوەنی یان بەدەسـتی بهێنێـت مـاڵ دارایـی و دەسـتەلاتە بەتایبەتـە ئەگـەر چاودێری بکات یاخود رای بسپێرێ.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا شکۆمەندی و دەسـتەلات و جوانییـە بـۆ بازرگـانیش سوودو قازانجە.

*باڵندەی گەورە بەڵگەیە لەسەر:

+پادشاو سەرکردەو ستەمکاران.

+زانایان.

+کاسبکارو دەوڵەمەند.

*باڵنـدەی ئـاو ڕەسەڵکی شـکۆمەندو بـەڕێزە دەسـتکەوتیان بەدەسـتهێناوە لەدەریاو ئاسماندا.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر سەفەرکارانی دەریاو وشکانی ، ئەگـەر خوێندیان شیوەندەکەن.

*ئـەو باڵندەیـەی دەخـوێنێ دەوڵەمەندە.

*باڵندەی بچووکیش منداڵی بچووکە.

*پۆلـە باڵندەیـەك بۆیـەکێك بیـانخوات یـاخود بەدەسـتیان بهێنێـت مـاڵ و سـامان و دەسـتەلاتە بەتایبـەت ئەگـەر چاودێریبکات و دانیان بۆ رۆبکات.

*ئەگەر بینی باڵنـدە بەسـەریەوە فـڕی دەسـتەلات و پلەوپایەیـەك بەدەستدەهێنێ.

*باڵندە کـردارە، دەگونجێـت باڵنـدەی نادیـار بەڵگـەبێت لەسـەر ئاگـاداری و ئامۆژگاری.

*ئەگەر باڵندەکەی جوانبوو لەخەودا کردارەکانی باش‌و پەسەند دەبن‌و نوێنەرێك بەخێر رووی تێدەکات.

*ئەگەر باڵندەیەکی ناقۆلاو ناشیرینی بینی لەگەڵ خۆیدا دەگونجێت کردارەکانی خراپ بن‌و نوێنەر بەشەڕو خراپە رووی تێکردبێ.

*باڵندی نادیار رزق‌و رۆزییە.

*هەروەها دەڵێن: باڵندەی رەش بەڵگەیە لەسەر کرداری خراپ‌و باڵندەی سپیش بەڵگەیە لەسەر کرداری چاکەو باڵندەی رەنگاورەنگ کرداری تێکەڵ‌وپێکەڵە.

**باڵندەفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کۆیلەفرۆش، دەگونجێت بینی بەڵگەبێت لەسەر کۆبوونەوە لەخۆشی‌و شادی.

**باڵندەو گۆشت‌و هێلکەی پاککراو:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا رزق‌و رۆزی خێرایە لەگەڵ شتومەکی بەسوودو قازانج.

*سەوزەی پاککراو بەڵگەیە لەسەر قەرزدانەوەو شایی‌و خۆشی یان غەم‌و پەژارەو نەبوونی.

**بانگبێژ:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیەلەسەر:

+خێر.

+دەلال.

+دەرگاوانی فەرمانڕەوا.

+بانگکراو لەزینداندا.

*ئەگەر بانگێکی تەواوی دا خەوەکەش لەمانگی (حەج)دابوو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر (حەج).

*دەگونجێت بانگدان بەڵگەبێت لەسەر دزی.

*ئەگەر ژنێك لەمنارەکەیدا بانگیدا لەو وڵاتە بیدعەیەکی گەورە سەر هەڵدەدات، ئەگەر منداڵانی بچووك بانگیاندا نەزانان زاڵدەبن بەسەر فەرمانڕەوادا بەتایبەت ئەگەر بانگدانەکە لەکاتی خۆیدا نەبوو.

*بانگدان بەڵگەیە لەسەر ئاشکراکردن‌و، بانگبێژی نادیار وەك دەستەڵاتدار وایە.

**بانگدان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لە(محمد)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (زید)ی (ئەنصاری) یەوەو ئەویش لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)و سەبارەت بەوەی لەخەودا بینیبوم دەربارەی بانگدان دوام ، ئەویش (ﷺ) فەرمووی: "ئەو خەونە راستەو هەستە بۆ (بلال)ی بگێڕەرەوە چونکە ئەو خاوەن دەنگێکی زوڵاڵە". (زەید) دەڵێت: ئنجا

هەستامو فەرمایشتەکەم بەجێهێناو دواتر: (عومەر)ی کوڕی (خەتتاب) هات(ﷺ) گوێبیستی بانگی (بلال)بوو ، پاشان فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا " منیش بەهەمان چەشنی (عبدالله)ی کوڕی (زەید)م دیوە ، حەزرەتیش (ﷺ) فەرمووی: "سوپاس بۆ خوا ئەمەش پتر جێگری دەکات"[1].

*لە(محمد)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (زید)ی (ئەنصاری)یەوە دەگێڕنەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستی زوڕنا بەکاربهێنێت ، پاشان فەرمانیکرد زەنگۆڵە بەکاربهێنرێت ، منیش نوستمو لەخەودا بینیم پیاوێك دووجلی سەوزی پۆشیوەو زەنگێکی هەڵگرتووە، وتم: ئەی بەندەی خوا ئەو زەنگە دەفرۆشی؟ وتی: بۆچیتە ؟ وتم: بانگی پێدەدەین، وتی: بۆ رێنوێنیت نەکەم بۆ شتێك لەوەباشتر؟ وتم: فەرموو ، وتی: بلێ : (الله أکبر) ، پاشان بانگی فێرکردمو هێدی هێدی رۆیشت بەڕێوە، دواتر فێری (اقامە)ی کردم ، کاتێکیش بێدارو بەئاگا بوم هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)و خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، حەزرەتیش (ﷺ) فەرمووی: "ئەم برایەتان خەوێکی بینیوەو ئێستاش بچۆ بۆ مزگەوت لەگەڵ (بلال)داو فێری بکەو بابانگ بدات چونکە دەنگی ناسكو خۆشە ، ئەوجا لەگەڵ (بلال) چوومو پێم وتو ئەویش دەیگوتەوەو بانگیدا، پاشان (عومەر)ی کوڕی (خەتتاب) (ﷺ) گوێی لێبوو هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا منیش هەمان خەوم بینیوە[1].

مامۆستا (ابو سعد) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: هەرکەس لەخەودا ببینێت جارێك یان دووجار بانگیداوەو دواتر قامەتی کردوە، پاشان نوێژی فەرزی ئەنجامداوە خوداوەند (حەج)و عەمرەی دەکات بەنسیب، بەبەڵگەی : ﴿وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ...﴾ (الحج:٢٧) چونکە لەمەیدانی

[1](ترمذي)لە (كتاب الصلاة) باب (ماجاء في بدء الأذان) (١/٣٦٦) فەرموودەی ژمارە (١٨٩) هێناویتیو دەڵێت: فەرموودەیەکی(حسن)ی (صحيح)ەو ، (ابن خزيمە) لە (صحيح)ەکەیدا (٣٦٣) و (بيهقي) لە (سنن الكبرى)دا (١/٤١٥) هێناویەتی.

[1](ابوداود) فەرموودەی ژمارە(٤٩٩) و ، (ترمذي) (١٨٩) و (ابن ماجە) (٧٠٦) و (بخاری) لە (خلق أفعـ" العباد) (١٣٧) و (الدارمي) (١١٧٨) ، و(أحمد) لە (مسند)ەکەیدا بە (٤٣/٣) هەموویان لەڕێگەی (ابن اسحاق)ەوە فەرموودەکەش (صحيح)ە.

(عـەرەفات) دووجار دووجـار بـانگ دەدرێت و ئیقامەش دەکرێت.

*ئەگەر بینی لەسەر بڵندکۆیەك بـانگ دەدات دەبێـت بـەبانگخوازی حـەق و راسـتی و حـەجی بـۆ دەخـوازرێ، خۆئەگـەر بینـی لەبیرێکدا بانگـدەدات هـانی خەڵکیـدەدات لەسـەر گەشـت و سەفەرێکی دوور.

*ئەگـەر بینـی بانگبێـژەو لەراسـتیدا بانگبێـژ نــەبوو دەســتەلاتێکی بەئەندازەی بـەرزی دەنگی پێدەدرێت ئەگەر شایستەی دەستەلات بێت.

*ئەگـەر بینـی لەسـەر بەرزاییـەك بانگـدەدات دەکرێـت بەدەسـتەلاتدار لەلایـەن پیـاوێکی عەجەمیـەوە، بـەلام ئەگـەر شایـستەی دەسـتەلات نـەبوو بازرگانیەکی بەسوودو قـازانجی دەسـت دەکەوێت یان پیشەیەکی ناوازە.

*ئەگەر بینی لەبانگدانەکـەدا زیـاد یـان کەمیکرد بەئەندازەی زیادوکـەم کردنـی ستەم لەخەڵکیدەکات.

*ئەگـەر لەشـەقامێکدا بانگیـداو خـۆی چـاکەکاربوو فـەرمان بەچـاکەو رێگـری لەخراپــە دەکــات، بــەلام ئەگــەر لەخراپـەکارانبوو شکـست دەهێنێـت و بەردەکەوێت.

*ئەوەشـی ببینـیٚ لەسـەر دیوارێـك بانگـدەدات پیاوێـك بـۆ ئاشـتەوایی و رێککەوتن بانگدەکات.

*ئەگـەر لەسـەربانی ماڵێـك بانگیـدا هاوسەرەکەی دەمرێت.

*ئەگەر لەسەر (کەعبە) بانگیدا بیدعەو کارێکی داهێنراو دەخاتە روو.

*بانگـدانیش لـەنێو (کەعبـە)دا بـاش نییـە، ئەوەشـی لەسـەربانی مـاڵی دراوسێیەکیان بانگ بدات خاووخێزانی و دراوسێکەی دەترسێنیٚ.

*ئـەوەی لـەنێو کۆمەڵێکدا بانگبـدات و وەلامـی نەدەنـەوە لـەنێو گـەل و کۆمەڵێکی ستەمکاردا دەژی ، بەڵگەش لەسەری ئەم ئایەتەیە:

﴿فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُم أَنْ لَعْنَةُ اللهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾(الأعراف: ٤٤).

*هەرکەسـێك ببینـیٚ بانگـدەدات و قامـەتیش دەکـات سـوننەتێك زینـدوو دەکاتەوەو بیدعەیەك دەمرێنێت.

*هەرکەسێك ببینیٚ منداڵێك بانگدەدات پـاکی و پـاکیزەبوونی بـاوك و دایکیـەتی لـەدرۆو بوختـان بەڵگـەش لەسـەری چیرۆکەکەی (عیسی)یە (عليه السلام).

*بانگـدان لەحەمامیـشدا لـەئاین و دینیشدا باش نییە.

*ئەگەر لەماڵێكی گەرمدا بانگیدا تایەكی توندوسەخت دەیگریٚ.

*ئەگەر لەماڵێكی ساردا بانگیدا تایەكی گەرمو سەخت دەیگریٚ.

*ئەوەشی ببینیٚ لەبەر دەركی دەستەلاٌتداردا بانگدەدات حەقو راستی دەدركێنیٚ.

*لە(ئیبن سیرین)ەوە دەگێڕنەوە دەڵێت: بانگدان جیابوونەوەیە لەشەریكو هاودەم بەپێی ئایەتی ﴿وَآذَانٌ مِنَ اللهِ وَرَسُولِه... ﴾ التوبة:٣).

*ئەگەر لەنێو كاروانێكدا بانگیدا دزیدەكات بەپێی ئایەتی ﴿أَيَّتُهَا العِيرُ إِنَّكُم لسارقون﴾(یوسف).

*بانگدانیش لەدەشت یان نێو هۆردوی سەربازدا خاوەنەكەی دەبێت بەسیخوڕی دزو جەردە.

*هەركەسێك زیندانی بێتو ببینیٚ بەپێوەیە یان نوێژ دەكات بەپێوە لێی جیا دەبێتەوە بەپێی ئایەتی ﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصلاةَ﴾(التوبة:٥٠).

*ئەوەی ببینیٚ ئازادەو بەپێوەیە قامەت دەكات بۆ نوێژ كاروبارێكی بۆ بەجێدێت كەپلەوپایەیەكی بەرزی هەیەو بەباشە پیایدا هەڵدەدەنو باسی دەكەن.

*ئەوەشی ببینیٚ لەبەردەركی ماڵی خۆیدا قامەت دەكاتو لەسەر جێگەكەیەتی دەمرێت.

*ئەوەی ببینیٚ بەگاڵتەو سووكایەتیەوە بانگدەدات خوداوەند ئەقلٌو ژیری لێدەسێنێتەوە بەپێی ئایەتی ﴿وَإِذَا نَادَيْتُم إِلَى الصلاةِ اتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ذَلِكَ بِأَنَّهُم قَوْمٌ لايعقلون﴾ (المائدة:٥٨).

*لە(دانیال)ی (بچووك)ەوە دەگێڕنەوە دەڵێت: هەركەسێك لەخەویدا ببینیٚ بانگ دەداتو قامەت دەكات، پاشان نوێژدەكات كردارەكانی تەواوو كامڵ دەبێتو لەهەمان كاتیشدا بەلٌگەیە لەسەر مەرگو فەوتان.

*ئەوەی ببینیٚ گوێبیستی بانگبووە لەبازاڕدا مەرگ یەخە بەپیاوێكی ئەو بازارە دەگرێت.

*ئەوەی گوێبیستی بانگ بێتو پێی خۆش نەبێت بۆ كارێك بانگدەكرێت بەدڵی نییەو نیگەرانە پێی.

*مامۆستا (ئەبو سەعد) دەڵێت: راستو رەوان لەم بوارەدا ئەوەیە: هەر كەسێك بانگدان ببیستیٚو خۆی ئەهلو شیاوبێت لەجێی خۆیدایەو بۆی باشە، خۆئەگەر یەكێك ببینیٚ شیاو نەبێت لەشوێنو جێگەی خۆیدا نییەو خراپە.

*ئەگەر لەزیندانێكدا بانگیدا گێلو نەزان بانگدەكات بۆ ئاشتەوایيو رێككەوتنو ئەویش رازی نابێت پێی.
*ئەگەر لەماڵێكدا بانگیدا ژنێك بانگدەكات بۆ ئاشتەوایيو رێككەوتن.
*ئەگەر بەزۆریش بانگیدا جووتدەبێت لەگەڵ ئافرەتێكدا.
*دەگێڕنەوە پیاوێك دەچێتە لای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم وەك ئەوەی بانگبدەم ، ئەویش پێی دەڵێت: (حەج)دەكەیت ، یەكێكی تریش دێتە لایو هەمان خەوی بینیوەو پێی دەڵێت: دەست دەبڕیت، دانیشتوانی كۆڕەكەی بەسەرسامییەوە لێی دەپرسن: چۆن ئەو دوانەت لەیەك جیاكردەوە؟ ئەویش دەڵێ: یەكەمیان رووخسارو سیمایەكی جوانی هەبوو لەڕوانگەی ئەو ئایەتەوە لێكمدایەوە كەدەفەرموێت: ﴿وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ﴾دووەمیش ناڕاستو چەوتو دیاربوو بەپێی ئەو ئایەتە لێكمدایەوە كەدەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا الْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَارِقُونَ﴾ (یوسف:٧٠).
*(نابلسی) دەڵێت: بانگدان لەخەودا بەڵگەیە لەسەر (حەج)كردن بەتایبەت گەر لە مانگەكانی (حەج)دابێت، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دووزمانيو ئاشكراكردنو جموجووڵو كۆچو خۆئامادەكردن بۆ جەنگ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دزی یان بەرزی پلەوپایەو گوێڕایەڵیو هاوسەر بۆ پیاوی رەبەن.
*بانگدان بەڵگەیە لەسەر :
+ هەواڵی راستو دروست.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بیدعەچیەكان لەو ولاتەدا.
*بانگبێژیش بانگخوازی چاكەیە یان مارە بڕ یاخود نوێنەری پادشایە یان سەردەستەی سوپایە.
*ئەگەر بانگێكي تەواویداو لەمانگەكانی (حەج)دابوو، بەڵگەیە لەسەر (حەج)كردن.
*ئەگەر ژنێك لەخەودا بانگیدا لەبڵندگۆی مزگەوتێكەوە بیدعەو كارێكی داهێنراوی گەورە لەو ولاتەدا سەر هەڵدەدات.
*ئەگەر منالی بچووك بانگیدا نەزانو لەئاین دەرچوو دەستەلات دەگرنە دەست بەتایبەت ئەگەر ئەو بانگدانە لەكاتی خۆیدانەبوو.
*ئەوەی ببینێ لەسەر منارەی مزگەوتەوە بانگدەداتو شایستەی

دەسـتەڵات بێـت پۆسـتی دەسـتەڵات دەگرێتەدەسـت بەئەنـدازەی بـەرزی دەنگی.
*ئەگـەر بازرگـانبوو لەبازرگانیەکەیـدا قازانجدەکات.
*دەگونجێت بانگیش بەڵگەبێت لەسـەر دوعـاو چـاکەو گوێڕایـەڵیو کـرداری چاکە.
*بانگـدان بەڵگەیـە لەسـەر ئاسـایشو رزگاربوون لەپلانی شەیتان.
*ئـەوەی ببینـێ لەبیرێکدا بانگـدەدات ئەگـەر لـەوڵاتی ناموسـوڵمان دابێـت بانگـەوازکردنی خەڵکـە بـۆ پرۆگـرامو ئـاینی خـودا ، بـەڵام ئەگـەر لـەوڵاتی موسوڵماناندابوو دەبێت بەسیخوڕ.
*دەگونجێت خاوەنی بیدعەو داهێنانێك بێتو بانگی خەڵکی بکات بۆی.
*ئەوەی ببینێ بانگدەداتو دینداربێت فـەرمان بەچـاکە دەکـات، ئەگـەر خراپەکاریش بێت دەکەوێتە بەر لێدان.
*ئـەوەی ببینـێ لەسـەر (کەعبـە) بانگـدەدات بیدعەچـیە یـان قـسەی ناشـیرین دەکـات بەرانبـەر یـارانی پێغەمبەر (ﷺ).
*ئـەوەی ببینـێ بانگـدەداتو پاشـان پاڵدەکـەوێت ژنەکـەی باسـی خـەڵکی دەکـاتو بـەزوبان ئازاریانـدەدات، خۆئەگەر رەبەنبوو ژن دەهێنێت.
*ئەگـەر ببینـێ لـەبازاڕدا بانگـدەدات دەبێـت بەسـیخوڕو دز، بانگـدانیش لـەکۆڵانو بـازاڕدا بەڵگەیـە لەسـەر ژیانێکی باشو خۆش.
*هـەروەها بانگـدان بەڵگەیـە لەسـەر جیابوونەوە لەهاوەڵو شەریك.
*ئـەوەی ببینـێ لەشـوێنو جێگەیـەکی وێرانـەدا بانگـدەدات ئاوەدانـدەبێتو خەڵکی زۆر دەبێت.
*ئەوەی ببینـێ لەحەمامـدا بانگدەدات تووشی لەرزو تا دەبێت.
*بانگدانو دەنگ بەرزکردنەوە بـەیادی خـوا بەڵگەیـە لەسـەر نزیکبوونـەوە لەگەورە پیاوان بەتایبەت ئەگەر دەنگی خۆشو زوولاَ بوو خـەڵکی کەمەنـدکێش کـرد بـەلای خۆیـدا، بـەڵام ئەگـەر بانگەکەی گۆڕی یان گاڵتـەی بـەبانگو یـادی خـواکرد، یـاخود عـەورەتو جێـشەرمی دیـاربوو بەڵگەیـە لەسـەر سـووکایەتیو بۆڵـە بـۆڵو قـسەی ناخۆش.
*ئـەوەی ببینـێ لـەنێو کۆمـەڵێکی ئاپۆڕەبەسـتوودا بانگـدەدات نەتـەوەو کـەلێك بانگـدەکات بـۆ لای راسـتی لەکاتێکدا ستەمکارن.

*دەگونجێت بانگدان بەڵگەبێت لەسەر شارەزابوون لەئاینی خودا.
*دەگونجێت بانگدان بانگکردن بێت بۆ فەرمانێکی دەستەڵاتدار.
*ئەوەی ببینێ بانگدەداتو (الله اكبر)و (لا الـه الا الله) لەبەر ناکات گاڵتەو سووکایەتی بەدوژمنەکەی دەکات.
*ئەوەی ببینێ لەئاسماندا بانگدەداتو خەڵکی وەڵامی دەدەنەوە پیاوێکە بانگەوازی خەڵکیدەکات بۆ چاکەو وەڵامیدەدەنەوە، دەگونجێت هەرکەسێکیان وەڵامی بدەنەوە (حەج)یان لەچارە بنوسرێت.
*ئەوەی لەزیندانێکدا بانگبدات گێلو نەزان بانگدەکات بۆ ئاشتەوایيو ئەویش رازی نابێت پێی.
**بانگکراو:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سەفەر بۆیەکێك گوێبیستی ببێت، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿اولئِكَ يُنَادَوْنَ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ﴾(فصلت:٤٤).
*بینینی بانگکراو بەڵگەیە لەسەر بڵاوکردنەوەی هەواڵ مەگەر لێخوڕینی بەرازو شتی حەرام بێت.
**بانگکردن:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی بانگکردن هاوەڵایەتی ملکەچو رسوایان دەکات.

*ئەگەر بانگی لێکرا لەرۆخی روبارو دۆڵێکەوە پلەوپایەیەکی مەزن وەردەگیرێ.
*ئەگەر لەشوێنێکی دوورەوە بانگی لێکرا سەرپێچی خودا دەکات بەپێی ئایەتی: ﴿اولئِكَ يُنَادَوْنَ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ﴾(فصلت:٤٤).
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا سەرپێچییە بۆیەکێك گوێی لێبێ، خوداوەند دەفەرموێت :﴿اولئِكَ يُنَادَوْنَ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ﴾(فصلت:٤٤).
*ئەگەر بینی بانگیدەکەن کەسانی سووكو نزمو رسوای خۆشدەوێ.
*ئەگەر لەقەراخی دۆڵو شیوێك بانگکرا دەستەڵاتێکی مەزن بەدەستدەهێنێت.
**بانگکردن بۆ سەرخوانی نانخواردن:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر کۆبوونەوە لەسەر خێر، ئەوەی بیبینێ دەیەوێت کۆمەڵێك بانگبکات خۆی دەخاتە نێوکارێکەوە لۆمەو سەرزەنشتدەکرێت لەسەری.
*ئەگەر بینی بانگی خەڵکیدەکاتو کۆمەڵێك ئامادەنو بینینی وەك ئەوەی لەنانخواردن بوونەتەوە پلەوپایەو دەستەڵات بەسەریاندا بەدەستدەهێنێت، ئەگەر لەو شوێنەدا غەمو پەژارەداربوو چاکدەبێتەوە.

*ئەگـەر بینـی بـانگکراو قبـوڵیکرد کەسێکی ئاوارەی دەگەڕێتەوە، ئەگەر بینی کۆمەڵێك بانگدەکات بۆ میوانداری خۆیدەکات بەنێو حاڵو بارێکدا لۆمەو سەرزەنشت دەکرێتو پاشان پاشگەز دەبێتەوە.

*ئەگەر بینی بانگدەکرێ بۆ کۆڕێکی نادیارو میوەی زۆرو شەرابی تێدایە بانگدەکرێ بۆ جیهادو تێکۆشان شەهید دەکرێت.

*بانگکردن بۆ وەلیمەو دەعوات لەخەودا پاشگەزبوونەوەو لۆمەی هەڵگرتووە.

**باوەشێن:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەرئەوەی هێمنیو پشووی پێ بەدەستدەهێنێ لەغەمو پەژارە.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر پشوو دەرووی خێر لەناڕەحەتیو دەوڵەمەندی دوای هەژاریو نەداری.

*دەگونجێت باوەشێن بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرو کوڕ ئەگەر لەقۆخبوو بەڵگەیە لەسەر ماڵوسامان بەدەستهێنان لەسەفەردا.

*باوەشێن پیاوێکە خەڵکی لێوەی پشوو بەدەستدەهێنن.

**باوێشك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: باوێشکدان نەخۆشییەو بۆنەخۆش بەڵگەیە لەسەر باشیو چاکی.

(نابلسی)دەڵێت: باوێشکدان لەخەودا ناپاکیەو کارو رەفتارێکە شەیتان رازیدەکات وەك لاواندنەوەو تەمبەڵی لەنوێژکردنداو بەڵگەشە لەسەر زاڵبوونو هەڵکوتان بەسەر دوژمنداو بەڵگەیە لەسەر پاراستن چونکە مرۆڤ فەرمانی پێکراوە خۆڕاگربێت ، ئەگەر لەنوێژدابوو هەتا لەشەیتان دوورە پەرێزبێت دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەدەرخستنی حاڵی مرۆڤ، هەروەها دەگونجێت نەخۆشییەك بێت هەرگیز لێی چاك نەبێتەوە.

**باهو( لاشیپان ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: باهو ، ژنە ، دەگێڕنەوە (ئیبراهیمی خەلیل) (سەلامی خوای لێبێت) بەهاوسەری (ئیسماعیل)ی کوڕی وتوە: بە(ئیسماعیل) بڵێ باهوی دەرگاکەی بگۆڕێ، کاتێ پێی وت تەلاقیدا[1].

*هەروەها دەڵێن: باهو دەوڵەتە.

---

[1] (ئیبن کثیر) لە(البدایة والنهایة)دا (١/١٦٠) هێناویەتی.

* دەگێڕنـەوە ژنێك دێت بۆلای (ئـیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا چوارچێوەی دەرگای سەرەوەم بینی کـەوت بەسـەر خـــوارەوەداو هــــەردوو لاکەیـــشیم هەرکەوتن‌و یەکێکیان کەوتـە دەرەوەی ماڵەکەم، ئەویش وتی: مێـرددار‌ی‌و دوو کوڕت لەسـەفەرن، وتـی: بـەڵێ، وتـی: کـــەوتنی چوارچـــێوەی ســـەرەوە گەڕانـــەوەی مێردەکەتـــە بـــەخێرایی‌و کـــەوتنی لاشـــیپانێك بـــۆدەرەوە کوڕەکەتـە کـچێکی غـەریب دەهێنـێ، ئەوەندەی نـەبرد مێردەکـەی گەڕایـەوە کوڕەکەشی ژنێکی غەریبی هێنا.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگـەر بینـی سـواری لاشـیپانی دەرگاکـەی دەبێـت ژنێـك مارەدەبڕێ. هەروەها دەڵێن: لاشیپان بـژێوی پەیـداکاری ماڵـە ، ئەگـەر بینـی لەبن دەریهێنـا ئەگـەر دەستەلاتداربوو لادەبـرێ، ئەگــەر هەڵکـەنراو ونبــوو لەبەرچاوی خاوەن ماڵ دەمرێ، ئەگـەر دەرهێنـراو ون نـەبوو نەخۆشدەکەوێ‌و چاکدەبێتەوە لەنەخۆشیەکەی.

* ئەگەر باهویەکی دانا هاوسـەردەگرێ‌و هەرچـــییەك رووبـــدات لـــەباهودا دەدرێتەپاڵ ژن.

**بایـنجـــان:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: باینجـان لـەکاتی خۆیـدا نـەبێت رزق‌و رۆزییـــــــە کەبەمانـــــــدوبوون بەدەستدەکەوێت.

(نابلـسی) دەڵێـت: باینجـان لەخـەودا لـەکاتی خۆیـدا بەڵگەیـە لەسـەر رزق بەکەمترین هەوڵ‌و خواردنیشی بەڵگەیـە لەسـەر بەهانـەگرتن‌و خـۆ بردنـەپێش بەقـسەو رق‌و قـین‌و غـەش. هـەروەها بەڵگەیە لەسەر پیاوی دووڕوو.

* دەگونجێـت بەڵگـەبێت بـۆ راوچـی‌و شکارچیان لەسەر خۆشی‌و شادی.

## ب ت

**بـت( پەیکـەر):** (نابلـسی) دەڵێـت: لەخـــــەودا پەیکـــــەرێکی بـــــەتاڵی داتاشـــراوەو، مرۆڤێکـــی ســـتەمکاری رووخسار جوان‌و رەوشت خراپە، ئەگەر بینـــی بتێـــك دەپەرســـتێ بـــەجیا لەپـــەروەردگار درۆ دەکـــات بـــەدەمی خوداوە بەهەڵبەستەیەکی ناڕەواو درۆ.

* ئەگـەر ئـەو بتـە لـەدار دروستکرابوو بەئاینەکـــــــەی نزکیدەبێتـــــــەوە لەدەســـــتەلاتدار یـــان دووڕوویـــەکی ســـتەمکار، ئەگـــەر لەچـــیلکەو دار دروســـتکرابوو ملـــدەکات بەمـــشتومڕو دەمەدەمەدا.

* ئەگەر بتەکە لـەزیو بـوو لەئاینەکەیـدا کارێـك ئەنجامـدەدات‌و نزیکدەبێتـەوە لـــەژنێك یـــان کـــچێکی عەجـــەمی بەخیانـەت‌و ناپـاکی، ئەگـەر لـەزێڕبوو لەئاینەکەیـدا کـارێکی خـراپ‌و نابـەجێ

دەكاتو لەپیاوێك نزیكدەبێتەوە كەوا خوداوەند خەشمو قینی لێیەتیو خراپەی لێدەست دەكەویو ترسی غەرامەی لێدەنیشێ.

*ئەگەر بتەكە لەزیوبوو ئاینەكەی دەكات بەهۆكارێك بۆ ناپاكیو دەست تێكەڵكردن لەگەڵ ئافرەتێكدا.

*ئەگەر بتەكەی بینیو بەندایەتیەكەی نەبینی ماڵو سامانێكی زۆر بەدەستدەهێنێت.

*بت بەڵگەیە لەسەر خۆشویستنی ئافرەت یا منداڵ.

*بت بەشێوەیەكی گشتی بەڵگەیە لەسەر عەجەمو گێلو كچ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی مرۆڤ سەرقاڵدەكات لەبەندایەتی وەك ماڵو پلەوپایەو خۆشەویستو هاوسەرو كوڕو هاوچەشنی ئەوە.

*ئەگەر بینی بتێكی پێیە ژنێكی كەڕ دەهێنێت یا عەجەمی یاخود سەرقاڵی قارچكدەبێت یان خوداوەند كوڕێكی پێدەبەخشێت.

*دەگونجێت بت بەڵگەبێت لەسەر رۆژگار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر جێگیربوون لەسەر كاروبارەكان، ئەگەر شكاندی لەخەودا یاناشیرینیكرد پلەوپایەیەكی بەرز بەدەستدەهێنیو سەردەكەویْ بەسەر دوژمنەكانیداو پارێزراو دەبێت لەپلانیان.

*ئەگەر بت بەڵگەبێت لەسەر ژن وێنەكەی جێگیردەبیو ئەقڵی دامەزراو دەبێت یان دەروونی سووكایەتی پێدەكریْ یاخود گێلو خۆلاپەسەند دەبێت.

## ب ج

**بـچڕان (بـڕین)**: (نابلسی) دەڵێت: بۆئەوەی خوداوەند فەرمانی گەیاندنی كردوە سەرگەردانییە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر باجو سەرانە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرئەوەی جیابوونەوەو پشت لەیەككردن دەهێنێت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "پشتلەیەك هەڵمەكەنو نێوانتان مەبچڕێنن".

## ب ر

**برا**: (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر مرۆڤ لەخەودا براكەی یان باپیرو مامو خاڵی بەدیكرد لەگەڵ ئەوەی هاوبەشی میراتە بەڵگەیە لەسەر هاوەڵ پەیداكردن لەماڵو یارمەتیدان، دەگونجێت هەندێكیان بەڵگەبن لەسەر ئەوانی دی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئاگر بەهۆی سوورییەوە یان بەڵگەیە لەسەر ئاژەڵ یاخود کوڵم یا گەنجینەو خاڵی رەش.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی سەرئێشەی بەردەوام یان برایەکی دایكو باوکی.

**برژانگدرێژ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پارێزکارییە لەئاین.

*هەروەها دەڵێن: باشیو خراپیان دەگەڕێتەوە بۆ کوڕو ماڵو منداڵ.

*ئەگەر بینی برژانگی زۆربوەو جوانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئاینەکەی پتەوو تۆکمەیە.

*ئەگەر بینی لەژێر سێبەری چاوەکانیا دانیشت ئەگەر دینداروزانستخوازبوو لەژێرسێبەری ئاینەکەیدا دەژی، ئەگەر دنیاخوازبوو پارەو ماڵی خەڵکیدەباتو خۆی وندەکات.

*ئەگەر بینی چاوەکانی برژانگیان نەبوو شەریعەتەکانی ئاین تیا دەبات، ئەگەر هەڵیکێشا دوژمنێك ئامۆژکاریدەکات یاخود ئابرووی دەبات لەئاینەکەیدا.

*ئەگەر بینی موەکانی سپیبوە بەڵگەیە لەسەر نەخۆشیەك دەدات لەسەرو چاوو گوێچکەو ددانەکانی.

**برژاو:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا مژدەیە لەسەر بژێوی، ئەگەر بەتەواوی نەبرژابوو ئەوە غەمو پەژارەیە لەلایەن کوڕەوە.

*مەڕی برژاوی قەڵەو ماڵێکی زۆرە، ئەگەر لەڕولاوازبوو ماڵێکی کەمو رزقێکە بەماندوبوونو هیلاکی بەدەستدێت.

*ئەگەر مەڕێکی برژاوی خوارد لەکاروکاسبی کوڕەکەی دەخوات.

*مانگای برژاو دڵنیاییە بۆ کەسێك بترسیٚ یان بۆ یەکێك ژنێکی دووگیانی هەبێت مژدەی کوڕێکی پێدەدریٚ.

*گوێرەکەی برژاو رزقو فەڕو پیتە بۆ یەکێك بەکوڵاوی بیخوات.

*ئەگەر گۆشتی مانگای خوارد دەچێتە بەردەمی دادوەرێك.

*هەموو شتێك بینینی ئاگری بەربکەویٚ لەبێداریدا رزقو رۆزییەکە بەگوناهو تاوان دەستگیر بوە.

*گۆشتی برژاوی مانگا دڵنیاییە بۆیەکێك بترسیٚ، ئەگەر خەوبینەر پێشبینی کوڕیدەکرد کوڕیدەبێت مژدەکە بەئەندازەی خۆیدەبێت.

*حوشتری برژاو دڵنیاییە لەترسو بیم، هەروەها دەڵێن: پیاوێکی ئازادی بەڕەوشتە سەرجەم رەوشەکانی هیچ خەوشێکی تێدا نییە، ئەگەر بەتەواوی نەبرژابوو لەکارەکەیدا ژیرو ئاقڵ نابێت.

*ئەگەر دەستی حوشترێکی برژاو هاتە دواندن لەگەڵی لەتیاچوون و فەوتان قوتاردەبێ.
*گۆشتی باڵندەی سورەوەکراو یان لێنراو رزق و رۆزییە بەغەدرو فێڵ لەلایەن ژنەوە دەستدەکەوێ، ئەگەر بەتەواوی نەبرژابوو زوڵم و ستەمی لێدەکات.
*هەموو بەچکەیەکی باڵندە بەبرژاوی یان سورەوەکراوی ماڵ و داراییەکە بەماندوبوون پەیدابوە.
*برژانی پەراسووی مرۆڤ لەخەوداو خواردنی قورس و غەم و پەژارەیە تووشی مرۆڤ دەبێت. پەراسووی برژاویش بەژن لێکدەدرێتەوە چونکە (حەوا) لەپەراسووی (ئادەم) سەلامی خوایان لێبێت - دروستکراوە.
*ئەوەی دوای پەراسوودێت سەرو نیوەی لاشە بەکچ لێکدەدرێتەوەو نیوەی ئەوەش بەکوڕ لێکدەدرێتەوە.
*باڵی برژاو ئەگەر تەواو برژابوو غەیبەت و باسکردنە.
*ئەگەر پارچەیەك گۆشتی برژاوی کڕی کەسێك بەکرێ دەگرێ.
*ئەگەر بینی گۆشتێکی برژاو یان لێنراو دەخوات رزق و رۆزییەك بەماندوبوون و هیلاکی بەدەستدەهێنێت.
*دەگونجێت لەخواردنی گۆشتی برژاودا ترس و بیم رووی تێبکات.
*هەروەها دەڵێن: برژاو غەم و پەژارەو ماڵی حەرامە.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی بەرانێکی برژاند نەخۆشدەکەوێ یان سزایەکی لەلایەن دەستەڵاتدارەوە پێدەگات یاخود زیندانیدەکرێ.
*ئەگەر گوێرەکەیەکی برژاند ژنەکەی نەخۆشدەکەوێ یان دایکی یاخود ژنێکی خانەوادەکەی.
*ئەگەر بەرخێکی برژاندو بەدەستی هێنا کوڕەکەی دەپێکرێ یان لەش و لاری ناتەواو دەبێ.
*ئەگەر گوێرەکەیەکی برژاندو خوازیاری کوڕبوو مژدەی پێدەدرێ وەگەرنا ترس و بیم رووی تێدەکات.
*دەگونجێت برژاندن بەڵگەبێت لەسەر مژدە لەقوتاربوون لەناڕەحەتی و سەرکەوتن بەسەر دوژمنداو بوونی منداڵی نێرینە بەتایبەت ئەگەر گوێرەکەبوو، ئەگەر حوشتربوو بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندی و شایی و چاکبوونەوەی نەخۆش و هاوسەرگیری رەبەن و گەڕانەوەی ئەوەی سەفەریکردوەو بڵاوبوونەوەی خۆشەویستی و تەبایی.

* دەگونجێت برژاندن بەڵگەبێت لەسەر فیتنە.
* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر لێگرتنەوەی نیعمەتو زیندانیو دوورخستنەوە ، تالأنکردنی ماڵو سامانو بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە بەهۆی گەرماوە.
* ئەگەر گۆشتێکی برژاند یا مریشکێ یاخود هەرشتێکی دی بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزیو شکۆمەندیو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا ئەگەر شایستەی ئەوەبێت، ئەگەر هیچکام لەوانە نەبوو فیتنەییو دوورنوبانیدەکات بەدەمی ئەوەی برژاندنەکە بەڵگەیە لەسەریو بەهۆیەوە ماڵو روحی دەکێشرێ.
(نابلسی)دەڵێت: گۆشتو هێلکە یان ماسیو هاوچەشنەکانی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دووریو، شتی برژاویش بەدەستهێنانی ویستو خوازەو گەیشتنە بەهیواو خواستو بەدەستهێنانی پێداویستییە، هەموو شتێك وادەوکاتێکی دیاریکراوی هەیە بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی پەیمانو پێداویستی لەگەڵ قەرزدانەوەو گەرانەوەی ئاوارەو قوتاربوونی زیندانی.
* برژاوی خۆش شەریکایەتیەکی بەسوودە.

**برسێتی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: برسێتی تیاچوونو بەسەرچوونی ماڵوداراییەو سووربوونە لەسەر بژێوی پەیداکردن.
* هەندێکدەڵێن: برسێتی باشترە لەتێربوون ئاودێیکردنیش باشترە لەتینوویەتی.
* هەروەها دەڵێن: ئەگەربینی برسییەتی خێری بەنسیب دەبێتو سووردەبێت لەسەری.
* ئەگەربینی یەکێکیتر بانگیدەکات بۆ نانخواردن خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر سەفەرێکی نزیك بەپێی ئایەتی: ﴿لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا﴾ (الكهف:٦٢).
* ئەگەر نیوەڕۆ بانگیکرد بۆ نانخواردن لەهیلاکیو ماندوبوون پشوودەدات، ئەگەر بانگیکرد بۆ نانخواردنی ئێوارە فێل لەپیاوێکدەکات بەرلەوەی ئەو فێڵی لێبکات .
* ئەگەربینی خواردنێك دەخواتو هەرس دەبێت سووردەبێت لەسەر هەوڵدانو پیشەکەی.
* ئەگەربینی گۆشتی لاشەی خۆیدەخوات لەماڵو دارایی پەسمەندەکراوو هەڵگیراو دەخوات.

* ئەگەر گۆشتی خەڵکیتری خوارد خواردنی غەیبەتە یان هی یەکێك لەخزماکانیەتی.
* ئەگەر بەلێنراوی خواردی یاخود بەسووروەکراوی سەرمایەی کەسانیتر دەخوات.
* ئەگەربینی گاز لەگۆشتی خۆیدەگرێت و دەیپچڕێ و فرێی دەداتە سەر زەوی پیاوێکە چاودادەگرێت و فێڵدەکات.
* خواردنی گۆشتی ژن لەلایەن ژنێکیترەوە یاخود خواردنی گۆشتی خۆی بەڵگەیەلەسەر ئەوەی زیناو داوێنپیسی دەکات و کرێی لەشفرۆش دەخوات.
* هەروەها لەلێکدانەوەدا خواردنی گۆشتی پیاویش وەك هی ژن وایەو، خواردنی گۆشتی لاو بەهێزترە لەهی پیرێك.
* ئەگەربینی گۆشتی زوبانی خۆیدەخوات لەلایەن زوبانیەوە سوود دەبینێ.
* دەگونجێت ئەو خەوە بەڵگەبێت لەسەر بێدەنگی و خەشم و قینگرتن و رەچاوکردن و دڵڕاگرتن.
* ئەگەربینی سەری خەڵکیدەخوات یان دەرخواردی کەسانیتری دەدات و موونێسقانەکەی دەگرێت ماڵ و دارایی لەسەرکردەی خەڵکی مەزنەوە بەدەستدەهێنێت، ئەگەر مۆخەکەیخوارد ماڵ و دارایی هەڵگیراویان دەخوات هەروەها سەری ئاژەڵ و درندەش هەروایە بەلام لەریزداریدا لەخوار سەری مرۆڤەوەیە.
* ئەگەر سەری خەڵکی بەبراوی بینی لەشارو گەرەك و ماڵەکەیدا یان لەبەردەرگاکەیدا سەری ئەو خەڵکە دێت بۆئەوجێیەو کۆدەبنەوە لێی.
* هەروەها گوتراوە: ئەگەربینی گۆشتی خۆیدەخوات ماڵ و دارایی و دەستەلاتێکی گەورە بەدەستدەهێنێت.
* گەربینی گۆشتی کەسێکی هەڵواسراو دەخوات یا گۆشتی گەڕو ئاولاویی ماڵ و داراییەکی حەرام بەدەستدەهێنێت.
* ئەگەربینی باوەشدەکات بەپیاوێکی مردوو یان زیندووەوە تەمەنی درێژ دەبێت ، هەروەها تەوقەکردنیش هەروایە.
* ئەگەربینی لەگۆشتی خۆی یاخود گۆشتی کەسێکیتر دەخوات ئەوەشی دەیخوات شوێنەوارێکی دیاروبەرچاوی هەبێت لەسەر ماڵ و دارایی خوادرن هی خۆی یاخود یەکێکی دی، ئەگەر شوێنەواری دیاری نەبێت لەسەری

غەیبــەتی مرۆڤێكـی خانــەوادەیكردوە یاخود غەیبەتی یەكێكیتری كردووە.
* ئەگەر گۆشتی كەسێكی هەڵواسراوی خــوارد مــاڵێكی حــەرامی خــواردوە لەكەسێكی پلەوپایــە بــەرز بەمــەرجێ ئــەوەی دەیخــوات شــوێنەوار بــەجێ بهێڵێت لەسەری.
(نابلــسی)دەڵێــت: هەندێكـــدەڵێن: برسێتی باشترە لـەتێری، تینوویـەتیش باشــترە لــەتێر ئــاویی، ئەگــەرببینی برسێتیەكی دووروودرێژ هـاتوە بەسـەریا نیعمــەتو بەخــشش رووی تێــدەكات دوای هـــەژاریو كەســـی برســـیش بەئەندازەی ئەو برسێتییە ماڵو دارایـی بەدەستدەهێنێت.
* برسێتی بەڵگەیە لەسەر:
+هاوەڵایــەتیكردنی یــەكێكی بێخێــرو چاكە.
+لاوازیو دنیانەویستی.
+رۆژووگرتن.
+گرانی شتومەكو كەمیو هەژاری.
+خواناســیو سوپاســگوزاریو یــادی خوا.
* ئەگــەرببینی برســییەتی لەزســتاندا برسێتی رووی تێدەكات.
(نابلـسی)دەڵێـت: لەخــەودا پادشــاو ســەركردەو پۆســتدارەكان، بەڵگەیــە لەســەر ملكەچـی ژێردەسـتەكانو چـاو برینە ماڵو سامانیان.

**بــرنج:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بـرنج مـــاڵو داراییەكـــە مانـــدوبوونو هیلاكیوخەمو خەفەتی لەخۆگرتووە.
(نابلــسی)دەڵێــت: بــرنج بــەلێنراوی بەڵگەیە لەسەر قازانج.
هەروەها(ئیبن سیرین) دەڵێت: چـەڵتوك مـاڵو داراییەكـە بەربـەرەكانیو خـەمو پەژارەیە.

**برنجفرۆش:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیـە لەسـەر بـەخێوكار كـەوا حـەق لەبـەتاڵ جیادەكاتـەوە بـەهۆی زەبـرو زەنگییەوە.

**برووسـكە:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بروسـكە بەڵگەیـە لەسـەر تـرسو بـیم لەدەستەلأتدار لەگەڵ هەرەشەو بەڵێن.
* هــەروەها بەڵگەیــە لەســەر لێــدان بەقامچی.
* دەگونجێــت لـــەلای دەســـتەلأتدار بەڵگەبێت لەسـەر پێچەوانەی پـەیمانو بـــەڵێنو بـــزەو خەنـــدەو دڵخۆشـــیو رووتێكردنو حەزو ئارەزوو.
* بروســـكە بەڵگەیـــە لەســـەر ترســـی موسافیرو حەزو ئـارەزووی جوتیـار بـۆ ئاودان.

*ئـەوەی بروسـکەی بینـی بـەدەر لەخەڵکی یاخود تیشکی ڕووناکی لێیدا بینایی لەدەستدەدات یاخود دەچێتە نێـو ماڵەکـەی، ئەگـەر گەشـتیارو موسـافیربوو پـشوو و بێکـاریی ڕووی تێدەکات بەهۆی بارانبارین یان بڕیاری فـەرمانڕەواوە، ئەگـەر کـشتیاربوو کشتوکاڵەکەی بەفـەڕو پیت دەبێـتو زەوییەکـەی تێـر ئـاو دەبێت بـەهۆی بارانـەوە خێرانـدار دەبێـت، ئەگـەر گـەورەو کاربەدەسـتی تورەبـوو لێـی بزەوخەندە دەیگرێ لەبەرانبەریدا.

*بوێـژو شـاعیرانیش بزەوپێکـەنین دەچوێنن بەبروسکەو گریانیش بەباران، چونکە پێکەنینو خەندە لای عەرەب دەرخستنی نهێنیو پەنهانە هەر بۆیە بەئاوەلابوون ناو زەدی دەکەن.

*ئەگـەر بـارانی لەگەڵـدابوو بەڵگەیـە لەسـەر نـاقۆڵایی ئـەوەی بـۆی دەردەکەوێتو بەسەریا دەگری، یاخود بروسکە قسەیەکە دەیخاتە گریان یان قامچیەکە خوێناویدەکات، بارانەکەش دەبێـت بەخوێنەکـەیو بەشمـشێریش ڕوحی لێدەسێنێتەوەو چاوانی فرمێسك دەڕێـژێتو خانەوادەکـەی بۆیـدەگرینو کەمدەمێنێتـەوە لەناویانـداو زوو دەمرێت.

*ئەوەی ببینێ بروسکەی گرتووە یان لێیداوە یاخود گەواڵەهـەورێك داهـاتووە بەسـەریانا مرۆڤێـك هانیـدەدات لەسـەر خێروچاکەو، بروسکەش بەڵگەیە لەسەر ترسو بیم لەگەڵ سوودو قازانج.

*هـەروەها دەڵـێن: بروسـکە بەڵگەیـە لەسـەر سـوودو قـازانج لەشـوێنێکی دوورەوە، ئـەوەی ببینـێ بروسـکە جلوبەرگەکـەی سـووتاندوە ژنەکـەی دەمرێت ئەگەر نەخۆش بێت.

(نابلـسی)دەڵێـت: بینینـی بروسـکە بەتـەنیا لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر ڕێنومایی دوای وێڵیو سەرگەردانی.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر تیاچـوونی بینـاییو دیـەی، ئەگـەر خەوبینـەر نەخۆشـبوو ترسـی مردنـی دەبێت.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر دەرخستنی نهێنی گۆڕانی هەواڵ.

*دەگونجێت بینینی بەڵگە بێت لەسەر:

+مژدەو هەواڵی خۆش بـەئامادەبوونی کەسێکی ئاوارەو دوورە وڵات.

+نوێبونەوەی ڕزقو ڕۆزیو فریاکەوتنی پەرێشان.

+گۆڕانی حاڵوباری لەناڕەحەتیەوە بۆ خۆشیو بەپێچەوانەشەوە.

+بەلگەیە لەسەر روناکی شمشێرو نووکی رم.

*ئەوەی بروسکە ببینیّو خەوەکەی لە(تشرینی یەکەم)دابێت بەلگەیە لەسەر پروپاگەندەو بەروبوومی دانەوێڵە ، ئەگەر لە(تشرینی دووەم)دابوو بەلگەیە لەسەر فەرو خێری زۆرو بێشومار، یاخود لە(کانونی یەکەم)دا دەترسیّ لەکەمو کورِی، خۆئەگەر لە(کانونی دووەم)دابوو لەکاتی دورێنەدا دەترسیّ لەکشتوکاڵەکەی ، خۆئەگەر لە(شوبات)دابوو بەلگەیە لەسەر چاکی لەکشتوکاڵەکەیدا، لە(ئازار)یشدا بەلگەیە لەسەر کەمی بەروبوومو دانەوێڵەو لە(نیسان)دا باشو چاکدەبێتو جۆش کەمدەبێت .

*ئەگەر لە(ئایار)دابوو هەندێك لەمیوەکان خراپ دەبن، لە(حوزەیران)دا بەلگەیە لەسەر شەونمی بەسوود، لە(تەموز)دا هیچ خێروشەرێکی تێدا نییە ، ئەگەرلە(ئەیلول)دابوو بەلگەیە لەسەر فەرو خێرو هەروەها لە(ئاب)یشدا بەهەمان شێوەیە.

**برۆ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: هەردوو برۆ باشی ئاینو پلەوپایەیە بۆ مەردووم کەمو کورِی تێیاندا کەمو کورِییە لەپلەوپایەو ئایندا.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر هەردوو برۆی پربوون باشە بۆ ژنان کەبرۆچاکدەکەن بۆ جوانیو خۆنواندن.

(نابلسی)دەڵێت: لێکدانەوەی باشو خراپە بەپێی زیادوکەمی کردارەکانە، هەردوو برۆ باوكو دایكو دووکورِو شەریكو دوو هاوسەرو جێگرن.

*ئەگەر هەردوو برۆی گەیشتن بەیەك بەلگەیە لەسەر ئالوودەییو خۆشەویستیو بەپێچەوانەشەوە، رەشیو پرِی موویان بەلگەیە لەسەر باشی حاڵی ئەوەی بەلگەیەلەسەری.

*سپێتی یان دابەزینیان بۆسەرچاو بەلگەیە لەسەر گۆرِانی حاڵی ئەوەی بەلگەیە لەسەریان لەکورِو هاوەڵو هاوسەرو جێگیرو هاورِیّ.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر تەمەندرێژی هەتا خۆی بەو چەشنە دەبینێتەوە.

*هەردوو برۆ بەلگەیە لەسەر پلەوپایە لەئایندا هەرچاکیو خراپییەك روویان تێبکات بیدەپاڵ چاکیو پارێزگارییان.

*دەگونجێت برۆ بەلگەبێت لەسەر پاراستنی ئەوەی چاو بەلگەیە لەسەری وەك برۆو فەرمانرِەواو چاودێرو مێرد،

هـەروەها کـەوانی تـیری ناگەهانـەی چاوپیسانە.

**بریـانی**: (نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا دڵتەنگیە دێت بەسەریا یاخود تووشـی دەبێت.

**بریـنـداریی**: (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: ئەگەربینی لەش‌ولاری بریندداربوە مـاڵو داراییەکی پێدەگات.

*ئەگـەر دەسـتی راسـتی بریـندارکرد مــاڵو داراییەکــە لــەلای پیــاوێکی خزمیــــەوە بەدەســــتی دەگـــات، ئەگەردەســـتی چـــەپی بریـنــــداربوو لــەژنێکی خزمیـــەوە ئــەو ماڵـــەی پێدەگات، بـەڵام ئەگـەر قاچـی چـەپی بریـنــــــداربوو مـــــاڵو داراییـــــــە کەلەکـشتوکاڵەوە بەدەسـتدەکەوێت ، بریـنـداری پەنجـەی دەسـتی چـەپ بەڵگەیـە لەسـەر زاڵبـوونی قـەرزاری بەســەریدا، هــەموو برینداریـیـەکیش خـوێنی لەبـەر بـڕوات خـەرجی‌و زیانـە لەماڵو دارایی دەکەوێت.

*ئەگـەر برینداریـیـەکی تـەڕ بەلـەش‌و لارییـەوە بینـی‌و خـوێنی لەبـەر ڕۆیـی زیانــە لــەماڵو دارایـــی خەوبینــەر دەکـەوێت، یـاخود گوفتـارو قـسەیە خاوەنەکەی تێدا دەکـەوێت‌و لەسـەری پاداشت وەردەگرێت.

*برینداری سەریش ئەگەر خوێنی لەبەر نـەڕۆیی نزیکدەبێتـەوە لـەوەی مـاڵو دارایی بەدەست بهێنێت، ئەگەر خوێنی لەبـەڕۆیی مــاڵو ســامان‌و دارایـــی بەدەستدەهێنێت، ئەگەر خوێنی لەبـەر ڕۆیی ماڵو داراییەکەو شـوێنەوارەکەی لەسەری دەردەکەوێت.

*ئەگــــەر فەرمانڕەوایــــەك یــــاخود پێشەوایەك بینیان سـەریان بریـنـداربوو هـەتا زامەکـە گـەیبوە سـەر ئێـسقان تەمەنی درێژ دەبێـت، ئەگـەر ئێسقانی شکابوو سوپاکەی شکست دەهێنێت‌و دەدۆڕێــت، ئەگــەر دەســتی چــەپی بریـنـداربوو سـەربازەکانی زیاددەکـەن بەڵام ئەگەر دەستی راستی بریـنـداربوو موڵك‌و دەستەڵاتی پەرەدەسێنێت.

*ئەگەر سکی بریـنـداربوو مـاڵو دارایـی گەنجینەی زیاد دەکات.

*ئەگــەر کــوڵم‌و گونــای بریـنــداربوو هۆزوتیرەی زیاددەکەن.

*ئەگەر قاچی بریندداربوو تەمـەنی درێـژ دەبێت.

*ئەگــەر هــەردوو قاچــی بریـنــداربوو لـــەکاروبارو مـــاڵو داراییـــدا پـــتر جێگیردەبێت.

*ئەگــەربینی وەك ئــەوەی مرۆڤێــك ئەنـدامێکی ببڕێـت‌و لـەت لـەت‌و پارچـە

پارچەی بکات ئەوکەسەی هەڵدەستێت بەبڕینی ئەندامەکانی قسەیەکی ناقۆڵا دەکات بەرانبەری‌و دەبێتەهۆی پەرتەوازەکردن یان خستنەوەی جیاوازی لەنێوان منداڵەکانیدا، ئەگەر بریندارکەر خوێناوییبوو بەخوێنی بریندار ماڵێکی حەرام بەدەستدەهێنێت بەئەندازەی ئەو خوێنەی پێی خوێناوی بووە، ئەوەشی بێباوەڕێك بریندارێکات‌و خوێن لەبەرئەوبێباوەڕە بڕوات زەفەر بەدوژمنێکی دیارو بەرچاو دەهێنێت‌و ماڵ‌و دارایی حەڵاڵی لێدەستدەکەوێت بەئەندازەی ئەو خوێنەی لەبەری ڕۆیشتووە، ئەگەر خوێناوییبوو بەخوێنی بێباوەڕ بەهێزترە .

*ئەگەربینی مرۆڤێك بریندارێکردووەو خوێنی لێنایەت بریندارکار قسەو وتەیەکی حەق دەکات بەرانبەری، لەوەڵامی پرسیارێکدا، ئەگەر خوێنی لەبەر ڕۆیی غەیبەتی دەکات بەوتەیەکی ڕاست‌و دروست.

*ئەگەربینی بەشێك لەلاشەی بریندار بوە بەچەقۆ یان هەرشتێکیتر ناتەواویی‌و عەیبەکانی بەردەکەون‌و هیچ خێرێکی تێدا نییە.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر لەئەندامێکیدا برینداری بەدیکرد ئەو دەستەواژەیە بۆ ئەندامی بریندار بەگەڕدەخرێت کەبریندارکراوە، ئەگەر سنگی بریندار بوو یاخود دڵی بۆ پیاوو ژنی لاو بەڵگەیە لەسەر عیشق بەڵام بۆ پیرو پەککەوتە بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر برین‌و زامێکی پێوەبوو خوێنی لەبەر ڕۆیی بڕێك پارە قەرزاردەبێت‌و لەبژێویدا ناڕەحەتی رووی تێدەکات، هەموو برینداریێەك خوێنی لەبەر بڕوات خەرجییە.

*ئەگەربینی لەشولاری یاخود ناخی برینێکی تەڕی تێدایەو خوێنی لەبەر دەڕوات زیانە بۆ خاوەنەکەی روو لەماڵ‌و دارایی دەکات، یاخود قسەیەکە لەلایەن ئەوکەسەوە دەکرێت‌و ئەجرو پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، ئەگەر سەری بریندار بوو ماڵ‌ودارایی هەبوو با پارێزگاری لێبکات، ئەگەر زام‌و برینێکی بینی‌و خوێنی لەبەر نەڕۆیی لەخێرو چاکەیەك نزیکدەبێتەوە کەوا رووی تێدەکات ، ئەگەر سەری پەنجەی ڕاستی بریندار بوو بەڵگەیە لەسەر قەرزارییەك تووشی دەبێت‌و غەم‌و پەژارە دەخوات بەدیارییەوە.

*ئەگەر ببینی یەکێك لەفریشتەکان بەشمشێرەکەی سکی بریندارکردو وەك ئەوەی بمرێت و لەسکیەوە کێم و زووخاڵ دەربچێت چاکدەبێتەوە.

*ئەگەر ببینی گەردن و ملی بریندار بوو ماڵ و دارایی لەپاشەرۆژدا بۆ دەمێنێتەوە لەلایەن کوڕەکەیەوە.

**برینسارێژکار:** (نابلسی) دەڵێت: ئەو کەسەیە هەڵدەستێت بەسارێژکردنی زام و برین، بینینی بۆئەوەی زامدارو بریندارە بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەو ڕەواندنەوەی غەم و پەژارە ، ئەمەش ئەگەر هاتوو ئەوبرین سارێژ کارە هات بۆلای خەوبینەر، هاتنی بۆ لای یەکێك کەپێویستی پێی نەبێت بەڵگەیە لەسەر برینداریی و پێویستی بوونی بەکەڵەشاخ و خوێن بەربوون ، برینسارێژکاریش لەخەودا پیاوێکە گۆشتی خەڵکی دەبڕێت و خوێنیان دەڕژێنێت لەئەندامە تەندروست و بێنەخۆشیەکانیان.

## ب ڕ

**برپەنگ:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا زویانە ، هەروەها بەجێهێنانی پێداویستیەکانەو باشی دەربڕینە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر پشتگیرو منداڵی پێگەیشتوو.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر داواکاریی و هاوسەرگیریی، ئەگەر بینی برپەنگی شتێکدەکات هاوسەردەگریێ چونکە لەهاوسەرگیری دەچێت.

**بڕین:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بڕینی سۆڵەکەی بێت غەم و پەژارە ڕووی تێدەکات.

*ئەگەر کەسێك شوێنێکی بڕی بڕاو لەوکەسەوە بەڵاو نەهامەتی لەلایەن بڕەرەوە تووشدەبێت و خەشم و قین هەڵدەگریێ لەناخیدا بەرانبەری.

## ب ز

**بزمار:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: فەرمانڕەوا یان دەستەلاتدارە، بەڵگەیە لەسەر پیاوێك خەڵکی بەهۆیەوە دەگەن بەکاروبارەکانیان وەك شایەت و عەریزەنووس، هەروەها بەڵگەیە لەسەر لاوێتی و بەڵگەی پێویست و یادو زیکرو ماڵ و سامان و هێزو توانا.

**بزن مژە (قۆڕی):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: هاوەڵ و هاودەمی فەرمانڕەواو پادشایە.

(نابلسی)دەڵێت: بزن مژە لەخەودا وەزیری پادشاو جێنشینیەتی و هەرگیز لێی جیانابێتەوە.

*بـزن مـژه پیاوێکـه سـووره لەسـەر کردارو بەڵگەیە لەسەر:
+پێـشکەشکردنی خزمـەتگوزاری بـۆ بێکار.
+فتنەو تێکچوونە لەئایندا.
+ژنـی ئاگرپەرسـت، چـونکە هەمیـشە لەگەڵ رۆژدا دەسووڕێتەوە.
+گریان و لاواندنەوە بەسەر مردوودا.

**بزنـەکێوی ( سـابرێن ):** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بزنـەکێوی بەڵگەیـە لەسـەر پیاوێکی دەرەکی بەناوبانگ.
*ئەگەر بینی بزنەکێوییەکی راوکرد یان بـەرانێك دەسـتکەوتی دەبێـت لەفەرمانڕەوایەکی دڵڕەقەوە.
*پێکاندنی بزنـەکێوی بەدەمانـچە یـان هەر ئامرازێکیتر بەڵگەیە لەسەر زەرەو زیان.

**بزنەمێچکە :** (نابلـسی) دەڵێـت: ئەگـەر بینـی لەخـەودا بزنـە مێـچکەیەکی بەدەستهێنا کچ یان ژنێکی ئاین خراپو بەدی داوێنپیس دەهێنێت.
*ئەگەر بزنێکی دۆزییـەوە خێرو فـەڕو خۆشی بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر بینی ژنان بوون بەبزنە مێچکە بێـشیریی بۆمـاوەی سـاڵێك رووی تێدەکات.

*بزنە مێچکە ژنێکی ملکەچ و رسوایە ناتوانێ کار ئـەنجام بـدات چـونکە وەك هەژارێك نهێنی دیارو ئاشکرایە.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر ساڵێکی مـام ناوەندی.

**بزەوخەنـدە :** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بزەوخەنـەدە باشـە لەخـەودا، ئەگـەر لەرادەبـچێتە دەرەوە دەبێـت بەغـەم و پەژارە.
(نابلسی)دەڵێت: بزەو خەندە لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر دڵخۆشـی و شـادی و شـوێنکەوتنی سـوننەت، چـونکە پێغەمبـەر (ﷺ) کـاتێ پێدەکـەنی بـزە دەیگرت.

**ب س**

**بـست ( بنگوسـت ):** (نابلـسی) دەڵێـت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەندازەو شتی نوێ و سەفەر.
*دەگونجێـت بـست بەڵگـەبێت لەسـەر گۆنیاو بەپێچەوانەشەوە.
*دەگونجێـت بـست بەڵگـەبێت لەسـەر ئـامرازی نێرینـەی مـرۆڤ، ئـەوەی زۆرانبازی ئەنجام بدات بەڕمێکی بچووك کەبەئەنـدازەی بـستێك بێـت کـچێك دەهێنێت.

**بسته( فستق )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: بـــستەماڵو ســـامانێکی ئاســـانەو دارەکەشـــی بەڵگەیـە لەسـەر پیـاوێکی دەستو دڵفراوان، ئەگەر بستەی خوارد ماڵێکی خۆشو ئاساندەخوات.

(نابلـسی) دەڵێـت: بـستەی ســەوز ماندوبوونو هیلاکییەو بستەی وشکیش شەڕو ئاژاوەیە ، بستەی سوێر رزقێکی خۆشو ئاسانە لەدەریاو وشکانییەوە.

*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر لەدایکبوونی نوێ.

**بـــسم الله ( نـــاوی خـــوا )**: (نابلـسی) دەڵێـت: ئـەوەی لەخـەودا بەخـەتێکی خـۆشو جـوان ببینـێ بەڵگەیـە لەسـەر زانـــستو ڕێنمـــایی‌و رزقو فـــەڕو تایبەتمەندیەکـــەی ئەوەیـــە لەســـەر بنەمای ناسراوی خۆی ببینێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کوڕ یـان کـوڕەزا بـەهۆی پابەنـدی هەنـدێکیان بەهەندێکیتریانەوە.

*دەگونجێـــت بینینـــی بەڵگـــەبێت لەسەرئەوەی بەسەرچوە لەپیتەکانی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر هەوڵدان بۆ هاوســـەرگیری‌و مـــژدەی دوایـــی ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسـەر ڕێنومـایی دوایی‌و وێڵی‌و سەرگەردانی.

*ئەگـەر لەخـەودا بەخـەتێکی جـوانو بـاشو دیـار نوسـرابوو رزقو ڕۆزییـەك لەپیـــشەکەیدا بەدەســـتدەهێنێت یـــا لەزانستەکەیدا.

*ئەگەر مردوو نووسی بەر سۆزو میهری خوایی کەوتووە.

*دەگونجێـــت نووســـینی بەڵگـــەبێت لەســەر ســوودو قــازانج، یــان ڕفانـدنی لەلایەن باڵندەیەکەوە بەڵگەبێت لەسـەر بەسەرچـوونو دوایـی هـاتنی تەمـەنی‌و کۆتــایی‌و تـــەوابوونی رزقو بـــژێوی، لەسەر ئەمەش ئـەوە هەڵدەسـەنگێنرێ کەیەکێك لەسەر دەستی ئـەودا قورئـان یــان شــتێکیتر بنووســرێتو لەوانەیـە خوداوەنـــد تاقیبکاتـــەوە بەلـــەش بەبارکردنی.

*هـــەروەها دەگێڕنـــەوە کاتێـــك (حەســـەن)ی کـــوڕی (عـــەلی) (رەزای خوایـــان لێبێـــت) لەخـــەودا بینـــی لەنێوچاوانی نوسرابوو ﴿والضُحَى ( ١ ) والليلِ إذا سَجَى﴾(الـضحی ) چـوو بـۆلای (ســەعید)ی کــوڕی (مـسیب)و ئـــەویش پێـــی وت: ئـــەی کـــوڕی پێغەمبەری خـوا(ﷺ) وەسیەتو داوای لێخۆشبوون بکە ، هەر دوای یـەك شـەو دنیای بەجێهێشت.

*ئەگەر لەنوێـژدا(بـسم اللـه)ی خوێنـدو ڕێبازو شـێوازی خۆشـی نەخوێنـدنیبوو لەنوێژدا ئەو خوێندنـە بەڵگەیـە لەسـەر

قــەرزێك كــەوا پێويــستی پێــی نييــە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مناڵێكو خۆشەويستی بـاوكی لابـێ بـەدەر لەدايكی يان خۆشەويستی دايكی بەدەر لـەباوكی يـاخود سـوننەتێك زاڵبكـات بەســەر فەرزێكــدا يــان بيدعەيــەك بەســەركارێكی پەســەندا، هــەروەها حــوكمی خوێندنــەوەی هــەر چــوار پێـشەواكە هـەر وايـەو وايـان دانـاوە ئەوەی لەخەودا پێـی نووسـراوە ئەگـەر بـەئاڵتوونو زێـڕ نوسـرابوو بەڵگەيـە لەسەر رزقو خۆشحاڵی بەگوێرايەڵی يا چـاككردنی نهێنـی مابـەينی بەنـدەو پــەروەردگار، يــاخود دەگونجێــت ناوبانگو چارەنووسێكی باشت بێت ، پێـچەوانەی ئـەوەش ئەگـەر بەشـتێك نوسرا نەدەبوو پێی بنوسـرێو لـەريزی قەڵەمدانــەبوو بــاش نييــە، بــەلاّم نووسينی بە :

+قەڵــەمی ئيمــزاو واژۆ ســەركەوتنو مەزنیو پلەوپايەيە.

+قەڵـەمی دادگـا ئەگـەر نووسـينەكەی ديارنـــــەبوو هەمەچەشـــــنەبوونە لەمەزهەبو رێگەو بيروبۆچووندا.

+ئەگەر بەقەڵـەمی عيبرانـیو سـريانیو هنـدیو هاوچەشـنی ئەوانــە نوســرا بەڵگەيە لەسەر رێبـازی سـەيرو سـەرنج راكــێش لەگــەڵ هاوســەرو كۆيلــەو خۆشەويستیو هاودەمی لەگەڵ غـەيبو ناديار.

+ئەگـەر بەقەڵــەمی ئاسـنين نووسـی بەڵگەيــە لەســەر هێــزو رزقو رۆزیو جێگيربوون لەهەر كاروبار.

*ئەگـەر وەك قەڵـەمی ئاسـايی وابـوو بەڵگەيە لەسـەر ميانـەڕەوی حاڵـەكان بەتايبـەت ئەگـەر بەقەڵـەمی خـواری گرێگرێ نووسرابوو.

*ئەگــەر قەڵەمەكــە رێــكو جوانبــوو بەڵگەيە لەسـەر پلەوپايـەی بـاش يـان زانيــاریو كــردار بۆئــەوەی لەخــەودا بەجێی دەهێنێت.

*ئەگــەر لەســەر پەڕەيــەك نووســی دەگونجێت باشی كردبێت يان ئەركێكی بەجێگەياندبێ.

*ئەگەر لەسـەر پێستێكی سـپی ئاسـك نووســـی هــــەوڵو كۆشــــشدەكات لەبەدەستهێنانی ميراتيدا.

*ئەگـەر لەپارچـەيەكی چـنراوی سـوور يــان زەرد يــاخود ســپيدا نووســی خۆشیو شادی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگــــەر لەپارچـــەيەكی چـــنراوی ســـەوزدابوو شـــەهيدبوون بەدەســـت دەهێنێت لای پەروەردگار.

*نووسـينی لـەهيتردا يـان بـەنور يـا ئاڵتوون مژدەيە.

*هەروەها دەگێڕنەوە (حسین)ی کوڕی (عەلی) (رەزای خوایان لێبێت) لەخەودا دەبینێ وەك ئەوەی لەنێوان هەردوو چاویدا سوورەتی (اخلاص) نوسرابێت، دەنێرێت بۆ لای (سەعید)ی کوڕی (مسیب) (رەحمەتی خوای لێبێت)و بۆیدەگێڕێتەوە ئەویش دەڵێت: ئەگەر خەوەکەی وابێت زوو دەمرێت، پاشان بەو چەشنە بەغەریبی گیانی سپاردو مرد.

**ب ش**

**بشۆر( شۆرەر):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پەروەرشیاری نەزان یان ئەوانەی کەوا ئامۆژگاری وەرناگرن.

*بینینی بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی غەم و پەژارەو ئەوەی خۆی بۆ سەفەر ئامادە دەکات.

**ب ل**

**بلوور:** (نابلسی) دەڵێت: بلوور لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ژنان ئەگەر لەخەودا ببینێ بوە بەخاوەنی دەفرێکی بلووری ئەوا ژنێکی خاوەن کەسێتی دەیکات بەهاوسەری.

**ب ل**

**بڵاوکارانی کێچ و ئەسپێ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا گەل و کۆمەڵێکی خراپن.

*ئەگەر بڵاوکارانی ئەسپێی بینی لەخەوداو نەیتوانی لایبەرێت کۆمەڵێ داوێنپیسی خراپەکار بەئابڕووی فێردەبن و ناتوانێ رێگریان لێبکات.

**بڵاوکردنەوەی گەوهەرو یاقووت:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر کەس کۆینەکردەوە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی زانستخوازان و کزبوونی سوودو قازانج ، ئەگەر کەسێکی شایستە کۆیکردەوە بەڵگەیە لەسەر دانانی شت وەك لەشوێنی خۆیداو سوود وەرگرتنی خەڵکی لێی.

**ب ن**

**بندق:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بندق پیاوێکی سەخی غەریبی روح قورسەو خەڵکی تەبا دەکات.

*هەروەها دەڵێن: ماڵ و داراییەکە بەماندوبوون دەستی کەوتوە ئەوەی بیخوات ماڵ و دارایی بەماندوبوون بەدەست دەکەوێت.

*هەندێکیتر دەڵێن: بندق و هەموو توێکڵدارێکی وشك بەڵگەیە لەسەر دەنگە دەنگ و خەم و پەژارە.

(نابلسی) دەڵێت: بندق بەڵگەیە لەسەر هەواڵی شارەکەی و شکاندیان و تالان وبڕۆی ماڵ و منداڵیان، دەگونجێت

بەڵگەبێت لەسەر لەدەستدانی کچێنی ئەگەر بەچەشنێکی نادیار بینی.

**بنەبەرد**: (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی زانایان یاخود کوڕەکانیان تیای دادەنیشن یاخود ئاژەڵەکانیانی تێدایە کەوا سواریدەبن یا کەشتیی سەفەرە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرگیریو خوداوەندیش دەفەرموێ: ﴿والقَوَاعِدِ مِنَ النِسَاءِ﴾ (النور: ٦٠).

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژن.

*دەگونجێت بنەبەردی جێگیر بەڵگەبێت لەسەر زانیاری یاخود پیشەسازی کەوا پشتی پێدەبەسترێ یاخود بنچینەی ئاین.

*ئەگەر لەخەودا بوو بەخاوەنی ئەو بنەبەردانە بەڵگەیە لەسەر:

+هاوسەر.

+منداڵی نێرینە.

+ڕێنومایی.

+زانیاری.

*دەگونجێت خەوبینەر نەخۆشبکەوێ بەوەی نەتوانێ جموجوڵبکات یان سەفەر.

*ئەوانەی لەمزگەوتەکاندا دانیشتوون پیاوچاکن.

*ئەوانەی لەماڵان دانیشتوون ژنانی داوێنپاکن.

*ئەوانەی لەبازاڕو کەنیسەکاندان ژنانی باشو داوێنپاکن، هەروەها دەڵێن: دەروازەی هەوەسبازیو وێڵیو سەرگەردانییە.

**بنەدار( بنەگۆتەرە )**: (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر نەتوانینو دانیشتنو نەبوونی جموجووڵ.

*بۆکەوشدروو لەحیمچیو هاوچەشنەکانیان بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجو بژێوی.

**بنەڕەتی ( سەرەگی )**: (نابلسی)دەڵێت: بینینی کەسی بنەڕەتیو سەرەکی لەخەودا بەڵگەیەلەسەر خاوەن بەندایەتیو خواناسی هەروەها بەڵگەیەلەسەر:

+جامباز.

+لەشفرۆش.

+ئەو زانایەی کەوا لەکاروبارە تێکەڵو ئاڵۆزەکاندا شوێنی دەکەوێت.

+پیاوێکی ئایندارو زانا.

+پیاوێك ماڵو داراییەکی زۆری هەبێت.

**بنێشت( جاچکە )**: (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا بنێشت دەجوێ ڕوو لەخراپەدەکات چونکە کاری نەتەوەی (لوط)ە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی بنێشت دەجـوێ گوفتارەكـانی دەربـارەی سكاڵاو شەڕو ئاژاوە دەبێت.

**ب و**

**بوختانكـەر( دووڕوو ـ فيتنـه ):** (ئـيبن سيرين)دەڵێت: خۆشحاڵیەكە بـەردەوام دەبێـت لــەژن و كـوڕو بازرگـانیو دەستەڵاتەوە دەكەوێتەوە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخـەودا دەروویـەكی بەردەوامـە لەگـەڵ دەسـتەڵاتداری یـان بازرگانیەو بەژن و كوڕ لێكدراوەتەوە.

**بورانـەوە:** (نابلـسی) دەڵـێ: ئەگـەر لەخەودا بینی بوورایەوە كارێكی غـەمو پەژارەدار رووی تێدەكات.

**بولبول:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ژنێكی قسەو گفت شیرین و خۆشی نەرمونیانە یـاخود پیـاوێكی گۆرانیبێـژە یـاخود قورئانخوێنە بۆ دەستەڵاتدار وەزیرێكی بەتەگبیرو رێك و پێكە.

**بوێری( چاونەترسی ):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پێشبڕكێیە بۆ خێر یان شـەڕ، دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر كـەمو كوڕی تواناو بێجووڵەیی.

*بەڵگەیـــە لەســـەر ســـووربوون و پێـداگرتن، یـاخود پێـداگرتن لەسـەر ئەشكەنجەو ئـازاردانی خـەڵكی یـاخود رووبەڕووبوونـەوەی دوژمـن هـەروەها ئازایەتیش وایە.

**ب وو**

**بووق ( كەڕەنـە ـ شەیپوور ):** (نابلسی) دەڵێـت: فـووكردن پێیـدا قوتـاربوونی پیاوچـاكانە، بینینـی فـووكردن پێیـدا حـەق و راسـتییەو لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر هـەواڵی راچڵەكێنەر، ئەگـەر بەتەنیا خۆی گوێی لێبوو دەگونجێت ئـەو هەواڵـە تایبـەتبێت بەخۆیـەوە ، ئەگـەر خـەڵكی بیـستیان هەواڵێكـە وابەستەی خەڵكییە.

*ئەگـــەر فـــووكردن بـــەبووقی زیندوكردنـــەوەی بیـــست وایزانـــی خـەڵكیش دەیبیـستێت (تـاعون) لـەو ناوچەیە زۆردەبێت چونكە فووی یەكەم مەرگی جیهانە، ئەگەر فووی دووەمـی بیـست بـۆ ژیانـە ، ئەگـەر نەخۆشـبوو چاكدەبێتەوە، ئەگەر لەوڵاتدا (تـاعون) بڵاوبـووەوە دەرەوێتـەوەو لەناویانـدا نامێنێـت، ئەگـەر نـەبوونیلن لـەنێودا بڵاوبـووەوە دەرەوێتـەوەو نرخـەكان دادەبەزن و دەروویان لێدەكرێتەوە.

*ئەگـەر گوێبیـستی فـووی دووەمبـوو بەڵگەیـە لەسـەر بوژاندنـەوەی بـژێویو بـوونی شـتی پـەنهان و نادیـار یـان دەركـەوتنی نهێنـیو چـاكبوونەوەی

نەخۆش یاخود قوتاربوونی زیندانی یان کۆبوونەوە لەگەڵ گەشتیارو ئەوەی لەسەفەر گەڕاوەتەوە.

**بوونی پەیوەندیی:** (نابلسی)دەڵێت: بوونی پەیوەندی لەخەودا بەڵگەی بەجێگەیاندنی پەیوەندی خزمایەتیە لەگەڵ بەردەوام بوون لەرۆژدا.

*ئەگەر لەخەودا پەیوەندی خۆشبوو لەگەڵ زاناو پیاوچاکان بەڵگەیە لەسەر پارێزگاریکردن لەتەبایی‌و خۆشەویستی‌و بوونی ئەمەکداری دەربارەی پەیمانەکانی یان نزیکبوونەوە لەخاوەن پلەوپایە وەك پادشاو فەرمانڕەواو وەزیرەکان بەهۆی ئەو ڕێزەی لێیدەگرن.

*ئەگەر لەخەودا پەیوەندی هەبوو بەیەکێك لەبیدعەکارانەوە یان خەڵکی زیمییەوە بەڵگەیە لەسەر خراپی ئاین‌و دنیای‌و کات بەفیڕۆدانی لەگاڵتەوگەپو ئارەزوودا.

**ب ۆ**

**بۆتە(قاڵب):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر لێوەکانی، بۆتەی راوبۆچوون بەڵگەیە لەسەرئەوەی بەرزتر دەبێ پێی.

*بۆتەی پیاو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەڕوات پێیدا.

*بۆتەی قورقوشم سوودو قازانجە بۆ خاوەنەکانی‌و بۆتەوقاڵبی شیرینیش بەهەمان شێوەیە.

**بۆق:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بۆق پیاوێکی خواناسی تێکۆشەرە لەگوێڕایەڵی پەروەردگاردا.

*کۆمەڵێ بۆق لەشار یان گەڕەکێك سزایە.

*ئەگەر گۆشتی بۆقی خوارد سوودو قازانج لەهەندێك لەهاوەڵانی وەردەگرێ.

*ئەگەر بۆقێك قسەی لەگەڵکرد ئەوە موڵك‌و دەسەڵات بەدەستدەهێنێ‌و، بۆقیش ئاگری (نەمرود)[1]ی کوژاندەوە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر خۆی لەگەڵ کۆمەڵێ بۆقدا بینی هاوەڵایەتی لەگەڵ خزم‌و دراوسێکانی باشدەبێ.

*کۆمەڵێ بۆق لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گەل‌و نەتەوەی جادووگەرو دەستبڕ، بۆیەکێك بژێوی لەسەر ئاوبێ بەڵگەی خێرو چاکەیە.

[1] **نەمرود:** ئەو پادشا ستەمکارەبوو ئاگرێکیکردەوەو خواناسانی فڕێدایە نێوی. (وەرگێڕ)

*ئەگەر بینی کۆمەڵێك بۆق لەشارێك هاتنە دەرەوە سزا لەوشارە بەنوێژو دوعا هەڵیدەگرێ.

*راوی بۆق شکستی بەرانبەرەو هاوچەشنە.

*دەگونجێت بۆق بەڵگەبێت لەسەر ئەوکاسەلێسانەی لەبەردەرکی دەستەلاتداران کەوتوون، یاخود زیکرو یاد خوێنان لەهەژارو دنیانەویستان.

*بۆق بەڵگەیە لەسەر خەڵکی قاوقیژکارو گواستنەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر.

*ئەگەر بینی بۆقێکی بەدەستهێنا لەگەڵ پیاوچاکێکدا تێکەڵدەبێ.

**بۆکس( لێدان - پیاکێشان ):** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر کەوتنە نێوکاری شەیتانو باشی دەرەنجامەکەی لەئایندا بەپێی ئایەتی: ﴿ فَوَكَزَهُ مُوسَى فَقَضَى عَلَيْهِ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ ﴾ (القصص:١٥).

**بۆگەنی ( بۆنی ناخۆش ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا مرۆڤ بۆنیکرد یان بینی بەڵگەیە لەسەر:

+سەرئێشە.

+لووتپژان.

+هەواڵی خراپ.

+بلاوکردنەوەی نهێنی.

+ئەمانی رق و قین.

+پشوودان دوای ماندوبوونو هیلاکی.

+قەرزدانەوە.

+نیازو شاردنەوە لەدەروونداا.

*ئەگەر منداڵێك بینی بۆگەنیکردوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خەڵکی لەبۆگەنی پێستی رادەکەن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مردنی بەکێمو برینەوە یاخود دەردو نەخۆشیو ناتەواویەکەوە.

**بۆگەنی زارو دەم:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی ببینێ دەمی بۆگەنی کردووە قسەو گوفتارێك دەکات ستایشی خۆیدەکاتو بەهۆیەوە دەکەوێتە سزاو ئەشکەنجەوە.

*ئەگەر بینی کەسانی دی دەمیان بۆگەن بووە وتەو قسەی نابەجێ دەبیستێت.

*ئەگەر بینی بەردەوام بۆنی دەمی بۆگەنە پیاوێك دەبێت فرە خراپەکارو قسەی نابەجێ دەکات.

**بۆنی حەبەشی:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زیناو تەنگەبەریو شاردنەوەی کارو رەفتاری خراپو بەد.

**بۆنیخۆش (کافور)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: بۆنیخۆش و جگەرەکێشان پیاهەڵدانە لەگەڵ ئەو مەترسییەی تێدایە بەهۆی دوکەڵەوە.

(نابلسی)دەڵێت: بۆنخۆشکردنی مردوو لەخەودا هۆی خۆشی و شادییە بۆ یەکێك غەم و پەژارەداربێت.

*ئەگەر بینی پەنای بۆ پیاوێك بردوە هەتا بۆنی خۆشی بۆ بکرێت هانا دەبات بۆ باروحاڵێك لەکاتی ناڕەحەتی و دەردەسەریدا.

*ئەگەر داوای لەپیاوێککرد بۆنیخۆشی بۆ بکرێت بۆ مردوویەك قسەدەکات دەربارەی هۆکارێك کەوا بوە بەهۆی تێکدانی ئاینی ، یاخود ئامۆژگاری دەکات یان داوای لێدەکات شتێکی پێبدات تا هەژاری پێ چارەسەر بکات یان هۆکارێك پێی قوتاربێت لەناڕەحەتی چونکە مردن تێکچوونی ئاینە یا زیندانی و گوناهی گەورەیە.

*کافووریش پیاهەڵدانی چاك و باشە، بۆنخۆشکردنی مردووش بەڵگەیە لەسەر باشی پیاهەڵدان و باسکردنی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چاکەکردن لەگەڵ خەڵکێك سوپاس و ستایش ناکەن لەبەرانبەری.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: بۆنیخۆش لەبنەڕەتدا پیاهەڵدانێکی باشە، گوتراویشە بۆ نەخۆش بەڵگەی مردنە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ژن بینی خۆی جوانکرد و بۆنیخۆشیدا لەخۆیدا دەچێتە دەروازەی کرداری باش ئەگەر مێردی نەبوو مێرد دەگرێ.

*بۆنیخۆش بۆ پیاو پیاهەڵدانێکی باشە، ئەگەر دزێك یا دەستبڕێك بۆنیخۆشیدا لەخۆی تەوبە دەکات، یاخود دەست لەپیشەی ناقۆڵای دەگرێتەوە، چونکە بۆنیخۆش گوزارشت لەخاوەنەکەیدەکات.

**بۆیاخچی**: بینینی بەڵگەیە لەسەر خاوەن حاڵ یان بەجێهێنەری پێداویستی لەزانایانی دەستەڵاتدار.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر تەوبە لەگوناهو تاوان و سەرپێچی ئەگەر لەخەودا رووپایەکی سپی بۆیاخکرد بەرەنگی سەوز ، بەڵام ئەگەر رووپایەکی سپی بۆیاخکرد بەرەش بەڵگەیە لەسەر پاشگەزبوونەوە لەئاین.

*ئەگەر لەماڵەکەیدا بۆیاخچی بینی لەوساڵەدا کەسێك لەو ماڵەدا کۆچی دوایی دەکات.

**بۆیەکردن( رەنگکردن )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: رەنگکردنی پەنجەکانی پیاو

بەخەنە بەڵگەیە لەسەر زۆری یادو زیکری خوا، ڕەنگکردنی پەنجەکانی ژنیش بەخەنە بەڵگەیە لەسەر چاکەی مێرد لەگەڵ ژنەکەی.

* ئەگەر بینی بۆیەیکردوە بەڵام ڕەنگی نەگرت مێردەکەی خۆشەویستی بۆدەرنابڕێ.

* ئەگەر پیاوێك لەپیدەستی خۆی بینی ڕەنگکرابوو بەماندوبوون‌و هیلاکی بڕێوی پەیدادەکات، ئەگەر دەستی ڕاستی بۆیەیەکی ناشیرینکرابوو خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پیاوێك دەکوژێت، ئەگەر وایبینی هەردوو دەستی ڕەنگکراون بەخەنە ئەوەی لەدەستیدایە دەریدەخات لەخێرو شەڕ یا ماڵ‌و دارایی یاخود بژێوی‌و پیشەی.

* ئەگەر هەردوو دەستی نەخش‌و نیگاردرابوو بەخەنە فرۆفێڵێك دەكات لەماڵ بۆئەوەی هەندێك لەكەل‌و پەلی ناو ماڵ ببات بۆ خۆی‌و خەرجی بكات بەهۆی كزی خەرجیەوە، لەو حاڵەشدا دوژمنی پێخۆشدەبێت‌و ملكەچی‌و سەر شۆڕی پێدەكات.

* ئەگەر ژنێك دەستی بەنەخش‌ونیگارو ڕەنگەوە ببینێ لەخۆجوانكردندا فێڵێك دەكات.

* ئەگەر نەخش‌و نیگارەكە بەقوڕبوو بەڵگەیە لەسەر زۆری یادو زیکری خوداوەند.

* ئەگەر نەخش‌و نیگاری دەستی بینی تێکەڵ‌و پێکەڵبوە منداڵەکانی دەپێکرێن‌و تووش دەبن.

* ئەگەر وایبینی دەستەکانی بەزێڕ نەخش‌و نیگارکراون ماڵ‌و داراییەکەی دەدات بەمێردەکەی یاخود بەهۆی ئەوەوە خۆشی‌و شادی ڕووی تێدەكات.

* ئەگەر پیاوێك بینی ڕەنگ‌و بۆیەکراوە بەزێر فێڵی لێدەکرێ‌و ماڵ‌و داراییەکەی تیادەچێت یان بژێوی لەدەستدەدات.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا داپۆشین‌و پەنهانییەو ریشی خەناوی‌و بۆیەکراو بەڵگەیە لەسەر ڕوپامایی‌و کردار هەڵبەستن.

* ڕەنگ‌و بۆیەکردن بۆ یەکێك شایستەی بێت خۆدەرخستنە بەنازو نیعمەت لەپێناوی ناچارکردنی دوژمندا، هەروەها بەڵگەیە لەسەر دڵنیابوون لەترس‌و بیم ، بۆیەکێکیش شایستەی نەبێت بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارەو بۆڵەو قەرزو دوورکەوتنەوەو وازهێنان لەخۆشەویست‌و دۆستان.

*لەلێکدانەوەشدا رەنگو بۆیەکردنی قژی سەری ئافرەت وەك بۆیەکردنی ریش وایە.

*بۆیەکردنی مووی سپی هێزو تواناو ستەمو شانو شەوکەتەو ئەو کەسە لەسەر سوننەتو رێبازی پێغەمبەر(ﷺ).

*ئەگەر سەری رەنگو بۆیەکرد بەدەر لەریشی ماڵو سامانی گەورەکەی دادەپۆشێ، ئەگەر هەمووی رەنگو بۆیەکرد هەژاری دادەپۆشێو داوای شانو شەوکەتو شکۆمەندی دەکات لەخەڵکی، خۆئەگەر قژی رەنگو بۆیەی وەرگرت شکۆمەندی بۆ دەگەڕێتەوە بەلاّم زۆر ناخایانێت یاخود بەرەزامەندی خۆیدەردەخاتو پاشان ئاشکرا دەبێت.

*ئەگەر وایبینی خۆی بەقوڕ یان گەچو ئەوشتانە رەنگدەکات خەڵکی خۆی پێ رەنگ ناکاتو قژەکەشی رەنگو بۆیەی وەرگرت بەحاڵێك خۆی دادەپۆشێ ئەستەمو دەگمەنە.

*ئەگەر قژەکەی رەنگو بۆیەی وەرنەگرت حاڵو باری بەدەردەکەوێتو ناشاردرێتەوە.

*ئەگەر وایبینی بەخەنە رەنگیکردوەو رەنگی گۆڕاوە پیاوێکی نەزانە بەلاّم لەو حاڵو بارەی پاشگەز دەبێتەوە.

*ئەگەر بینی هەردوو لاقی رەنگو بۆیەکراونو نەخشو نیگاریان تێدایە خانەوادەکەی دەپێکرێ ، ئەگەر ژنێك خەوێکی بەوچەشنەی بینی کۆستی دەکەوێت بەمەرگی مێردەکەیو ژینی ناخۆشو پڕ دەردەسەریدەبێت.

*ئەگەر دەستی بەکەلاکێك رەنگ بکاتو پینەیەکی پێوەبێت لەبەریەرەکانیدا شکستدەخوات بەدەستی دوژمنەکەیەوەو ناتوانێت زاڵبێت بەسەریا.

*رەنگو بۆیەکردن بۆ ژنو پیاو خۆشیو شادییە ئەگەر لەئاستی خۆی دەرنەچێت.

*بۆیەو رەنگکردن بەڵگەیە لەسەر:

+شاردنەوەی کردارو گوێڕایەڵی.

+شاردنەوەی هەژاری لەبەرچاوی خەڵکیدا.

+زۆر لەخۆکردنو روپامایی ئەگەر بەپێچەوانەی موسوڵمانانەوە بۆیەو رەنگکرا.

*ئەگەر بۆیەو رەنگ هەڵواسرا حاڵوباری بەدەردەکەوێت.

*بۆیەو رەنگکردنی هەردوو دەستو قاچ جوانکردنی ماڵو خزمەتکارو ماڵو داراییە بەشێوەیەکی ناشیاو وەك پۆشینی جلوبەرگی ئاوریشمو ئاڵتوون.

* ئەگەر هەژاربوو دەگونجێت لەوانەبێت دەستنوێژی بەتاڵ دەبێتەوەو واز لەنوێژ دەهێنێ.
* بۆژنان خۆشحاڵیو خۆشیو شایییە چونکە لەجوانکارییەکانیانە لەئاهەنگو شاییدا.
* دەگونجێت رەنگو بۆیەکردنی دەست سەفەر یا دیلکردن بێت ، ئەگەر رەنگو بۆیەکردنەکە لەدەستو قاچ ترازا وەك پیشەوکاری ژنان ترسو بیمێکی زۆر سەری لێدەدات بەهۆی ماڵو هاورێییەوە بەئەندازەی ئەو رەنگەی کردوویەتی.
* ئەگەر بینی بەشێکیتر رەنگو بۆیە دەکات حاڵوباری نەویستراو رووی تێدەکات یان حاڵو باری خۆی بەبریارێك دادەپۆشێ.
* رەنگو بۆیەکردن بەخەنە لەگەڵ شاردنەوەدا بۆیەکێك ئێشو ئازاردارێت بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی.
* رەنگو بۆیەکردنی قژیش بەرەنگی رەش بەڵگەیە لەسەر خراپبوونی ماڵو حاڵیو تێکچوونی کاروکردار چونکە گوتراوە یەکەم کەسێك بەرەش رەنگی قژو سەریکردبێ (فیرعەون)بوە.
* دەگونجێت بۆیەو رەنگکردن بەڵگەبێت لەسەر شاردنەوەی دەموچاوو نەزانینی.

## ب ە

**بەئاگا هاتنی مرۆڤ:** بەئاگا هاتنی مرۆڤ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جموجووڵو چوستو چالاکیو رووتێکردنو تەوبەو سوودو قازانجو گەرانەوە لەسەفەر.

**بەتاڵ:** بینی شوێنی چۆڵو بەتاڵ بەڵگەیە لەسەر پەیمان شکاندنو ناپاکی.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مردنی نەخۆش چونکە لانەو ماڵی غەریبە.
* هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر پشوودان دوای ماندووبوونو خۆشیو شادی دوای بێزاریو دڵتەنگی.

**بەچۆکداهاتن:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر نوێژکردن بەدانیشتنەوە وێرای ئەوەی دەتوانێت بەپێوە نوێژ بکات.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر وازهێنان لەسەفەرو سووککردنی هۆکارەکانی، یاخود لاوازی ویستو خوازی، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێتو روو بەخێرو لەشاساغی دەچێت ، ئەگەر دەوڵەمەندبوو هەژاردەکەوێت، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەستنی پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ خەڵکیدا.

**بەچکەی قەلەڕەش:**(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر هەژاریو ئاتاجی دوای دوورکەوتنەوە لەخزمو خانەوادە. ئەوەشی لەحاڵێکی لەو جۆرەدابێت بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندیو پڕکردنەوەی ئاتاجیو کۆکردنەوەی لەگەڵ خانەوادەکەی چونکە بەچکەی قەلەڕەش لەدایكو باوکی دەبڕێ کاتێ لەهێلکە دێتەدەرەوە ئەوجا خوداوەند مێشو مەگەزی بۆ دەنێرێ هەتا بژی لەسەری تا پەڕ دەردەکات، کاتێ پەڕی دەرکرد ئەوجا وردە وردە دەفڕێ.

**بەخاکسپاردن:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی مردوەو ئەسپەردە دەکرێت سەفەرێکی دووری دەکەوێتەبەرو پاشان دەپێکرێ بەپێی ئایەتی: ﴿ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ، ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنشَرَهُ﴾ (عبس: ٢١-٢٢).

*ئەگەر بینی وەك ئەوەی لەگۆڕێکدا ئەسپەردەی خاکدەکرێت بەبێئەوەی بمرێت خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی ئەسپەردەیدەکات تووڕەو زیندانیدەکات.

*ئەگەر بینی لەگۆڕێکدا مرد لەغەمو پەژارەدا دەمرێت، ئەگەر مردنی نەچەشت قوتارو ڕزگار دەبێت لەزیندانیو ستەم.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر ئەسپەردەبکرێ ئاینەکەی تێکدەچێ، ئەگەر بینی وەك ئەوەی لەگۆڕهاتە دەرەوە ئومێدەواری تەوبە دەبێت.

*ئەگەر بینی خۆڵیکرد بەسەریدا یاخود گەیاندیە لێواری گۆڕ دەکەوێتە ناڕەحەتییەوە.

*ئەگەر بینی خرایە نێوگۆڕیچەوە ماڵو لانەیەك بەدەستدەهێنێت، ئەگەر خاكو خۆڵکرا بەسەریا بەئەندازەی ئەو خاكو خۆڵە ماڵو پارەی دەستدەکەوێت.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر ئەسپەردەی خاك بکرێ ئاینی تێکدەچێت مەگەر لەدوای ئەسپەردەکردنی لەگۆڕەکەی بێتە دەرەوە.

*ئەگەر خاكو خۆڵکرا بەسەریاو دەستیان تەکاند بەسەریا ناهومێد دەبن لەتەوبەکردنی.

*ئەگەر مرۆڤێك بینی خەریکە بەزیندوویەتی ئەسپەردە دەکرێت بەڵگەی خراپی سەرجەم خەڵکییە یان بەڵگەیە لەسەر زیندانیکردنی زوریەیان یاخود چەوساندنەوەیان.

*ئەگەر بینی یەکێك لەزانایان یاخود دانایان لەماڵی ئەودا ئەسپەردە دەکرێتو زیندووبێت یان لەگۆڕەکەی بێتە دەرەوە لەزانیاریو داناییدا

دەبێت بەجێگریو دەچێتە شوێنی ئەو.

*هەروەها ئەگەر یەکێك لەپێغەمبەرانی بینی یا خواناسێك دەبێت بەمیراتگری زانیارییەکەی.

*ئەگەر بینی ئەسپەردە دەکرێ دوای رۆژئاوابوون یاخود دوای نیوەڕۆ یان لەکاتی ئێوارەدا بەڵگەیە لەسەر فەرمانکردن بەچاکەو ڕێگری لەخراپە.

*ئەسپەردەکردنی کەسێکی زیندوو خراپەو دەستبڕینە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەوڵەمەندی ئەوەی دەخرێتە ژێر خاکەوە دوای هەژاریو نەداری یاخود هاوسەرگیری دوای ڕەبەنیو دڵخۆشی دوای شادیو کامەرانی.

*ئەسپەردەکردنی مردوو بۆ زیندوو بەڵگەیە لەسەر خایاندنی قەرز لەسەر ئەوەی کەلەلایەتی یان بەهۆی دەستەبەرکردنیەوە دەستگیر دەکرێ.

*ئەسپەردەکردنی مردوو بۆ جاری دووەم چاوپۆشینە لەوەی لێی ڕوویداوە لەخراپە.

*ئەسپەردەی مردوو بۆ مردوو یەکگرتنو پاکیو نێوان خۆشیو تەبایی دۆستو خۆشەویستانە.

*دەگونجێت ئەسپەردەکردن زیندانی بێت یان نەخۆشی یاخود هاوسەرگیری یا دانانی ئەمانەت یاخود ڕەهنکردن.

*ئەگەر بینی مردوە یان ئەسپەردەکراوە تەوبەدەکات.

*ئەگەر بینی لەگۆڕ هاتە دەرەوە تەوبەدەکات.

*هەروەها دەڵێن: تەوبەکردن بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری.

*ئەگەر بینی بەبێئەوەی بمرێت ئەسپەردە دەکرێت زیندانی دەکرێتو تەنگی پێهەڵدەچنن.

**بەختیاری( خۆشیو شادی )**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەی دڵنەواییە چونکە واژوویەتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەرچوون لەناڕەحەتیو دەوڵەمەندی بێت بۆ هەژار.

**بەخشین ( پێدان )**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی کەسێك دەبەخشێ بەیەکێکیتر دوژمنێکی خوا پێدراوە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر کچێکی پێبەخشی بازرگانیو سوودی پێدەبەخشێ.

*ئەگەر شتێکی پێداو بەڵگەبوو لەسەر نێرو هاوسەرەکەی دووگیانبوو کوڕی دەبێت. هەروەها ئەگەر شتێکی دایە

بەڵگەبوو لەسەر مێینە منداڵەکەی کچ دەبێت و بەخشینەکەش خێرەو هەمووشی بەیەك مانا هاتووە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەئەندازەی بەخشینەکەیە، ئەگەر کەمی بەخشی بۆ یەکێك شایستەی زۆربوو بەڵگەیە لەسەر پشتکردنە خوداو سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ).

* ئەگەر لەخەودا داوایکردو پێی نەبەخشرا تورەدەبێت لەماندوبوون و هەوڵدانی لەئایندا و ڕێبازی فیتنەگەران دەگرێتەبەر.

* ئەگەر بینی بەخششی قەرزداران دەدات لەماڵی خۆی ئەگەر نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر مردن و تیاچوونی ماڵەکەی و بەهەدەردانی ، ئەگەر لەشساغبوو بەڵگەیە لەسەر تێکچوون و بەرزکردنەوەی دەنگی، ئەمەش بەڵگەی خێرە بۆ هەژاران و سوودو قازانجە بۆیان.

* هەموو شتێك مرۆڤ بینی بردیان بەفەرمانی فەرمانڕەوا بەڵگەیە لەسەر سوودێك پێیدەگات لەفەرمانڕەواوە.

**بەخۆشك کردنی ژن:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی نهێنی کەوا غەم و پەژارەی هەڵگرتوە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+سوێند.

+چوونە لای ژن لەپاشەوە.

+پشتهەڵکردن لەڕۆژی پێویستدا.

**بەخیلی و ئێرەیی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەخیلی باسی پاشەملەیە ، ئەگەر بینی بەخیلە لەپاشەملە باسدەکات. بەخشینی ماڵ و دارایش بەزۆر بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونەوەی چارەنووس بەپێی ئایەتی: ﴿وَأَنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ﴾ (المنافقون:١٠).

* ئەگەر بەویستی خۆی بەخشی خێرو رزق و ڕۆزی بەدەست دەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ﴾(سبأ:٣٩).

(نابلسی) دەڵێت: بەخیلی و ئێرەیی بردن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نەخۆشییەکی بێچارە لەبێداریی و بەئاگاییدا.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دووڕوویی و ئەوکارو کردەوانەی مرۆڤ بەرەو ئاگری دۆزەخ بەکێشدەکەن.

* دەگونجێت بەخیلی بەڵگەبێت لەسەر رژدیی و هەژاری و پێدانی ماڵ و منداڵ و میراتییەك کەبەخراپ بەگەڕ بخرێ.

**بەدەستهێنانی ویست و خواز:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر

زیادبوونی زانیاریو نزیکبوونەوە لەخوداو ماڵو سامانی حەڵاڵ بەدەستدەهێنان ، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەر دەگریو ویستی بەجێدێت.

**بەدەنگەوە هاتن (وتنی لبیك اللهم):**

(نابلسی)دەڵێت: بەدەنگەوەهاتن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەرزکردنەوەی سکاڵاو نارەزاییو بەرزکردنەوەی چیرۆكو بەسەرهات بۆ گەورە بەرپرسانو دواتر بەدەستهێنانی سەرکەوتن.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر وەلامدانەوەی ئەوەی پرسیاری لەبارەوە دەکرێ.

* ئەگەر بینی لەکاتی (حەج)دا (لبیك...)دەڵێت سەردەکەوێت بەسەر دوژمنانیدا.

* ئەگەر بەدەنگەوە بچێت خاوەنی ئەمانەتو ئاینەو ئەسپەردە بەخەڵکی دەگەیەنێت.

**بەراز:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەراز پیاوێکی خۆشحاڵی بێدینەو سەرچاوەی بژێویو دارایی حەرامەو، پیسو گەندەڵەو هەموو شتێکی پیسو حەرامە.

* ئەگەر بەرازی بەخێوکرد دەبێت بەفەرمانرەوا بەسەر گەلو کۆمەڵێکی لەو چەشنەوە.

* ئەگەر بوو بەخاوەن بەراز یاخود بەدەستی هێنا لەشوێنێك یان بەباشی بەستیەوە ماڵو داراییەکی حەرام بەدەستدەهێنێت.

* بەچکەکانی لەگەڵ شیرەکەی بەلاو نەهامەتییە روو لەماڵو داراییدەکات یان لەئەقڵو ژیری.

* ئەگەر سواری بەرازێکبوو دەستەلاتو فەرمانرەوایی بەدەستدەهێنێتو زەفەر بەدوژمنی دەبات.

* ئەگەر بینی وەك بەراز دەڕوات بەڕێوە شتێك بەدەستدەهێنێت چاوی پێی گەشدەبێت.

* گۆشتی بەراز بەلێنراویو سورەکراوی ماڵێکی حەرامە بەپەلە بەدەستی دەهێنێت.

* دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین) ودەڵێت: لەخەودا بینیم بەرازێك لەجێگەکەمدایە، ئەویش دەڵێ: دەچیتە لای ژنێکی بێباوەڕ.

* دەگێڕنەوە کیسرا (ئەنوشیروان) لەخەودا بینی لەجامێکی ئاڵتوونیدا دەخواتەوەو لەگەڵیدا بەرازێك لەهەمان جامدا ئاودەخواتەوە، خەوەکەی بۆ

راڤەکارێکی خەوگێڕاپەوەو ئەویش پێی وت: ژوورە تایبەتەکانت چۆڵکە لەژن‌و غولام‌و بەردەست‌و منداڵ پاشان کۆیان بکەرەوەو با من‌و تۆ بەتەنیا لەژوورەوەبین‌و چاوم ببەستەرەوە ئنجا راڤەکاری خەو تەپڵێکی گرت بەدەستەوەو دەستیکرد بەلێدانی‌و بە(کیسرا)ی وت: یەك بەیەکیان رووت بکەرەوەو بیانکەن بەژووردا سەما بکات، ئەویش داوای راڤەکاری خەوەکەی جێبەجێکردو یەك بەیەك دەیانکردن بەژووردا‌و نۆرە هاتەسەر یەکێك لەکەنیزەکەکان‌و یەکێك لەخزمەتکارەکان وتی: پادشای مەزن چاوپۆشی بکە لەمەیان‌و کەنیزەکێکە تەمەنێکی بەسەر بردوە، ئەویش وتی: نابێت دەبێ وەك ئەوان بکات ، کاتێ رووتیانکردەوە بینیان پیاوە، ئنجا راڤەکاری خەو بە(کیسرا)ی وت: ئەمە لێکدانەوەی خەوەکەیەو، جامەکەش ئەم کۆمەڵەیەو خواردنەوەی مەی‌و بادەش تام‌و چێژو لەزەت وەرگرتنە لێیان ، بەرازەکەش کەهاوبەشی خواردنەوەی کرد لەگەڵتا ئەو پیاوەیە.

(نابلسی) دەڵێت: بەراز لەخەودا دوژمنێکی نەفرەت لێکراوی بەهێزە سکالا دەکات لەکاتی نارەحەتی‌و بەلاو نەهامەتیداو ئەوەی دەیڵێت جێبەجێ ناکات، ئەگەر بینی سواریدەبێت ماڵ‌و داراییەکی زۆر بەدەستدەهێنێت.

*بەرازی کێوی بەڵگەیە لەسەر باران‌و سەرمایەکی توند بۆیەکێك سەفەر بکات یان ئەوەی بەدەریادا بڕوات ، بۆیەکێکیش کێشەو بەربەرەکانی هەبێت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دوژمنەکەی پیاوێکی بەهێزو خاوەن تواناو دەستەڵاتەو قسەو وتەی ناقۆلا دەکات، بۆ خەڵکی گوندنشینیش بەڵگەیە لەسەر نارەحەتی‌و بەلاو نەهامەتی کەرووی تێدەکات، بۆ جوتیاریش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەیچنێ بەپێی خوازو ویستی خۆی دەرناچێت، ئەوەشی دەیەوێت هاوسەرگیری بکات لەگەڵ ژنێکدا لەگەڵ ئەو ژنەدا نابێت کەخۆی دەیەوێت.

* هەروەها بەراز بەڵگەیە لەسەر ژن .

* گۆشتی بەرازیش لەخەودا باشە بۆ سەرجەم خەڵکی، ئەگەر ببینێ گۆشتی بەراز دەخوات بەسورەوەکراویی زۆر باشەو بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجێکی خێرا.

* ئەگەر بەرازی لەخەودا بینی دەبێت بەفەرمانڕەوا بەسەر گەل‌و نەتەوەیەکی جوولەکەو مەسیحی، ئەگەر سووربێت

لەســەر دەنـگ دابـڕین لەژنەکـەی‌و لەخـەودا بـەرازو مـالۆس ببینـێ تەلاقیدەدات‌و لێی جیادەبێتەوە.

*دەگونجێت بەراز بەپیاوێکی جوولەکە گوزارشتی لێبکرێ یان مەسیحیەك.

*بینینی بەراز بەڵگەیە لەسەر:

+شەڕو خراپەو زوڵم‌و ستەم.

+مـاڵ‌و دارایـیـەکی حـەرام بـۆ یـەکێك بەحەرامی بزانێت.

*بەرازی مێیەش بەڵگەیە لەسەر زۆری وەچە.

*ئەگـەر زیـانێکی پێبگـات لەخـەودا دەگونجێـت لەلایـەن مەسـیحیەکەوە بۆڵەبۆڵ‌و قسەوباس بکرێ بەرانبەری.

*ئەگـــەر بـــەرازێکی بەدەســـتهێنا زاڵـــدەبێت بەســـەر پیـــاوێکی دەستەلاتداردا.

*ئەگـەر بـوو بـەخاوەن بـەراز دەبێـت بەخاوەنی ماڵ‌و سامانێکی زۆر.

*ئەگـەر بینـی بـوە بەبـەرازێ مـاڵ‌و دارایی‌و فەڕو بەرەکەتی دەستدەکەوێت بەملکەچی‌و رسوایی لەئایندا.

*بـەراز پیـاوێکی گـەورەی کاریگـەری بێئاینـەو کاروکاسـبی پـیس‌و گەندەڵـە یاخود مەسیحیەکی بەزەبرە ، گۆشت‌و چەوری‌و موو سك‌و پێستەکەی مـاڵێکی حـەرام‌و سـووکە، شیرەکەشـی بـەلاو ئەهامەتیـە روو لـەماڵ‌و دارایـی دەکـات بۆیەکێك بیخواتەوە یاخود روو لەئەقڵ‌و ژیری دەکات.

*ئەگەر بینـی گۆشـتی بـەراز دەخـوات زاڵدەبێت بەسەر دوژمنێکی ستەمکاردا.

*ئەگەر بینـی گۆشـتی بـەراز دەخـوات ئەوە مـاڵێکی حـەرام بەدەسـتدەهێنێت یاخود روو لەسەرپێچیدەکات.

*ئـەوەی بەچکە بـەرازێك ببینـێ دێتـە نێوماڵەکەی خزمـەتگوزاری فـەرمانڕەوا رووی تێدەکات.

*ئەگـــەر بینـــی بـــەراز دەردەکـــات لەماڵەکەی دەستبەرداری کاروپیـشەی دەستەلاتدار دەبێت.

(دمـیری) دەڵێـت: گۆشـتی بـەراز بـۆ سەرجەم خەڵکی باشە لەخەودا چونکە بەراز بەکەڵك نییـە دوای مـردن نـەبێت، ئەوەش ماڵێکی حەرامە بەپێی ئایـەتی: ﴿ حُرِمَ عَلَيكُمُ المَيتَةَ والدَّمَ وَلَحمَ الخِنزِيرِ﴾ (البقرة: ١٧٣)ئەمەش ئامـاژەی تێدایە.

**بەران:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیـاوێکی قەڵغاندارو پارێزراوە وەك دەستەلاتدارو پێشەواو ئەمیرو سەرکردەی سوپا.

*بەڵگەیە لەسەر شوان.

*بەرانی کێوی بەڵگەیە لەسەر ملکەچی یان خەساندن چونکە شاخی نییەو هێزو توانای بەشاخ دیاریدەکرێ.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر لابراوی هەڵکێشراو لەدەستەڵاتدارو فەرمانڕەوا.
*ئەگەر بەرانیکی سەربڕیو نەیزانی بۆچی سەریبڕیوە پیاوێکە لەناکاو زەفەری پێدەبات یاخود شایەتی حەقی لێدەدات ئەگەر لەسەر سوننەتو رووبەقیبلە سەریبڕی‌و ناوی خوای لێهێنا لەکاتی سەربڕیندا، ئەگەر واژووی ئەوەبوو پیاوێك دەکوژێ یان ستەمی لێدەکات یاخود ئازاریدەدات.
*ئەگەر بۆ گۆشت سەریبڕی لەکاتی لێکدانەوەی حوشترو مانگادا کرداره، ئەگەر بۆ بەندایەتی‌و نزیکبوونەوە لەخوا سەریبڕی تەوبە دەکات ئەگەر تاوانباربێت ، ئەگەر قەرزاربێت قەرزەکەی دەداتەوەو نەزرەکەی جێبەجێدەکاتو بەگوێڕایەڵی لەخوداوەند نزیکدەبێتەوە ، مەگەر بترسێ لەکوشتن یان زیندانی بێت یاخود نەخۆش‌و دیل ئەوجا قوتار دەبێت چونکە خوداوەند (ئیسماعیل)ی رزگارکرد - سەلامی خوای لێبێت - ستایشێکی جوانی بۆ دابەزاند لەسەرخۆی‌و باوکی بەسوننەتو بەندایەتیەوە کارەکەی دەکرێت تا رۆژی قیامەت.
*ئەگەر بەرانێکی سەربڕی‌و لەجەنگدابوون سەرکەوتن بەدەست دەهێنن بەسەر دوژمنی مەزندا.
*بەرانی سەربڕاو لەشوێنێکدا گەل‌و کۆمەڵێکی کوژراوە.
*ئەگەر بەرانێکی کڕی پیاوێکی رێزدار پێویستی پێدەبێ‌و بەهۆیەوە لەنەخۆشی‌و تیاچوون قوتار دەبێ.
*ئەگەر بەرانێکی بینی بازیدا بەسەریا ئازارو جنێویان لەوانەوە پێدەدرێت.
*بردنی شاخی بەران قەڵغان‌و سوپەرە، خوریەکەشی بەدەستهێنانی ماڵ‌و سامانە لەپیاوێکی بەرێزەوەو بردنی دووگەکەشی بەدەستهێنانی دەستەڵاتە بەسەر هەندێك لەرێزداران یاخود بۆمانەوەی میراتییە.
*بردنی نێوسکی بەران بەدەستهێنانی گەنجینەی پیاوێکی بەرێزە کەوا دەدرێتە پاڵ بەران.
*ئەگەر بەرانی هەڵگرت لەسەر پشتی بژێوی‌و ئەرکی پیاوێکی رێزدار هەڵدەگرێ.
*پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "لەخەودا بینیم بەرانێکم دابەزەویداو بەوە لێکمدایەوە بەرانی ئەو کۆمەڵە

دەوکوژم، هەروەها بینیم مشتۆی شمشێرەکەم شکا ئەوەشم بەوەلێکدایەوە پیاوێك لەکەسەکانی خۆم دەکوژرێ"[1].

*ئەگەر بەرانی لەپێستەکەی دامالّی جیاوازیدەکات لەنێوان پیاوێکی مەزنو مالّو سامانەکەیدا، ئەوەشی سواری ببێت زالّدەبێت بەسەریا.

*چەوری بەرانو پێستەو خوریەکەی مالّو خێرە بۆ یەکێك بەدەستی بهێنێت.

*ئەگەر بەشە قوربانیەکی بۆ بنێردرێ کورێکی پیرۆزی دەبێت.

*ئەگەر بینی کوشتار لەگەلّ بەرانێکدا دەکات ناکۆکی لەگەلّ پیاوێکی گەورەدا دەکات، هەرکامێکیان ببەزێ سەرکەوتوو دەبێت چونکە دوو جۆری جیاوازن، بەلاّم دوو جۆری چوون یەك وەك دووپیاوە ئەگەر زۆرانبازییانکرد دۆڕاو سەرکەوتوودەبێت.

*ئەگەر لەمالّی خۆیدا بەرانێکی لەپێستەکەی دامالّی لەو شوێنەدا مرۆڤێك دەمرێ ، هەروەها ئەندامی ئاژەڵیش هەر بەوچەشنەیە.

*خواردنی گۆشت بەبۆگەنی غەیبەتەو گۆشتی قەڵەویش باشترە لەلاواز.

*یەکێك بینی بووە بەبەرانو لەزەوییەکی بەردەلاّنی رەشی فرە کونو کەلەبەردا دەڕواتو بەرزدەبێتەوە، خەوەکەی لای راڤەکارێکی خەوگێڕایەوە ئەویش وتی: پلەوپایەو ناوبانگ بەدەستدەهێنێ لەسایەی پیاوێکی رێزداری مالّو ساماندااردا ، یاخود دەگونجێت خزمەتی بەرپرسو فەرمانڕەوایەك بکەیت.

(نابلسی)دەڵێت: بەران لەخەودا پیاوێکی رێزداری پارێزراوە، ئەگەر بینی شاخی بەرانێکی گرتووەو پیاوێکی رێزدار رێگەی لێدەگرێ ئەوە لەلایەن پیاوێکی رێزدارەوە پشتگیری دەکرێ، ئەگەر دووگەکەی گرت دەبێت بەخاوەنی کاروباری پیاوێکی رێزدارو دەبێت بەمیراتگری یان کچەکەی دەبێت بەهاوسەری ، ئەگەر ئەوەی لەنێو سکیدابوو بردی دەبێت بەگەنجینەداری یاخود ئەوەی تێدایە بەدەستی دەهێنێت.

*ئەگەر بەرانێك چوە کۆڵی پیاوێکی گەورە بەبڕیارەکانی زالّدەبێت بەسەریاو، کارێکی پێ ئەنجامدەدات ئەو رقی لێدەبێتەوە.

---

[1] (ئەحمەد) لە(مسند) دا (٢٧١/١) بەژمارە (٢٤٤٥) هێناویەتی.

*ئەگەر بینی شاخی بەرانێکی شکان یان یەکێك لەشاخەکانی پیاوێکی گەورە دەبەزێنیٚو پلەوپایەی کەمدەکاتەوە.
*ئەگەر بەرانێکی بینی مرد پیاوێکی گەورە دەمریٚ.
*ئەگەر بەرانێکی بینی سەربڕابوو گۆشتەکەی بەشکرا پیاوێکی گەورە دەمریٚو ماڵەکەی بەشدەکریٚ، ئەگەر گۆشتەکەی خوارد ماڵو سامانی دەخوات.
*ئەگەر بەرانێکی لەماڵی خۆیدا بینی لەپێستەکەی داماڵراوە هەندێك لەخزمەنزیکەکانی دەمریٚ، ئەگەر گۆشتی رانیبوو نزیکترین کەسی دەمریٚ.
*ئەگەر بینی بەرانێك سووردەکاتەوە بۆماوەی ساڵێك پلەوپایەی پێدەسپێریٚ.
*ئەگەر چەن بەرانێکی زۆریان پێدا هەر بەرانێك دەستەڵاتی ساڵێکە، ئەگەر خەوێکی وای بینیو لەسەر (کابە)بوو ژمارەی بەرانەکان ئەو ساڵانەیە ئیشوکاری تێدادەکات.
*ئەگەر بینی سەری بەرانی بۆ هێنرا سەری دوژمنەکانیەتی.
*خوری بەران ماڵو سامانە.

*بەران بەڵگەیە لەسەر بانگبێژو شوان.
*بەران سەرکردەی سوپایە.
*ئەگەر بەرانێکی مارەبڕی جیاوازی دەخرێتە نێوان خۆیو ماڵەکەی لەلایەن پیاوێکی مەزنەوە.
*ئەگەر مەڕێکی بینی بوە بەبەران ژنەکەی دووگیان نابێت، ئەگەر ژنی نەبوو هێزو دەستەلاتو سەرکەوتن بەسەر دوژمندا بەدەستدەهێنێت.
*بەرانی رەش دەدرێتە پاڵ عەرەبو هی سپیش عەجەم.
**بەرانەکێوی:** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تاجەگوڵینەو ویقارو رێزو شکۆمەندیو دامرکانو خەفەکردنی دوژمنان.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر پیاوێکی غەریب لەشوێنو جێگەی بەرزو پلەوپایەی سەرکردایەتی هەبێتو خواردنو خواردنەوەی حەلاڵ بێت.
*ئەوەی ببینیٚ سەریبوە بەسەری بەرانەکێوی پلەوپایەو دەستەلات بەدەست دەهێنێت.
**بەربەلەم:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کچ یا کوڕ یاخود خزمەتکارە.
*بەربەلەم بەڵگەیە لەسەر کچو کوڕو دایەنو پەروەرشیار.
**بەرچایی( ژەمی بەیانی ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر

ناڕەحەتی بەپێی ئایەتی: ﴿ قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴾ (الكهف: ٦٢).

*ئەگــەر بینــی داوای ژەمــی بــەیانی دەكات ماندوو هیلاكدەبێ.

**بــەرخ:** (نابلــسی) دەڵێــت: بینینــی لەخــەودا بەڵگەیــە لەســەر ژن ، ئەگــەر بینی بەرخێكی پێكا ژنێكدەهێنێت.

*ئەگـــەر بینـــی بـــەرخێك دەڕوات لەبەردەمیداو خۆشـی بـەدوایا دەڕوات‌و پێی ناگاتـەوە، دوای ژنێـك دەكـەوێت‌و بۆی بەدەستنایەت.

*ئەگـــەر بینـــی بـــەرخێك دەدۆشـــێ لەوساڵەدا خێری دەستگیر دەبێت.

* لەخەودا كوڕێكی نێرینەی گوێڕایـەڵی دایـك‌و باوكییـــەتی، ئەگـــەر بینـــی بـــەرخێكی پێبەخـــشراوەو ژنەكەشـــی دووگیـــان بێــت مــژدەی پێــدەدرێت بەكوڕێكی گوێڕایـەڵ. هـەروەها هـەموو ئـاژەڵێكی بچووك غـەم‌و پەژارەیـە بـۆ یـەكێك ببێـت بـەخاوەنی چونكە لـەبۆ پـەروەردەكردنی پێویـستی بەخـەرجی هەیە بەڵام كچان لەخەودا دنیان.

*ئەگـــەر بینـــی لەخـــەودا بـــەرخێك ســـەردەبڕێت كـــوڕێكی دەمرێــت یــان كوڕێكی كەس‌وكاری دەمرێ.

(ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بـەرخ كـوڕە ، ئەگەر بینـی بـەرخێكی سـەربڕی هـەروا بێئەوەی بیخوات كوڕێكی خۆی یان هی كەسێكی نزیكی دەمرێت.

*ئەگەر گۆشتی بەرخی بەدەستدەهێنا كوڕێكی بەڕێزو پیرۆزی دەبێت.

*ئەگەر گۆشـتی بـەرخ بەدەستبهێنێت ماڵێكی كەمی بەدەستهێناوە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی بـەرخێكی بـۆ نێـردرا كـوڕێكی رێـزدارو پـیرۆزی دەبێت.

*ئەگـــەر بینـــی كۆمەڵـــە بـــەرخێك بـــەخێودەكات مـــاڵ‌و دارایـــەك بەدەستدەهێنێت لەگەڵ رێزو ناوبـانگی باش.

**بەرد:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بـەردی فڕێدراوی مردوو دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسەر مردوو بەهۆی بڕین‌و هەڵكەنـدنی لەچیا.

*بەرد بەڵگەیە لەسەر دڵـڕەق‌و بێئاگـاو نەزان.

*ئەگـەر بینـی بـوو بـەخاوەنی بـەرد یـاخود بـۆیكرا یـان لەسـەری وەسـتا زەفەر بەپیاوێكدەبات هـەمان سیفەتی هەیــە یــان ژنێــك بەگومانــدەهێنێت بەئەنـدازەی ئـەوەی لـەحاڵی بێداریـدا هەستی پێدەكات.

*ئەگـەر گـۆڕاو بـوو بەبـەرد دڵـی ڕەقدەبێ‌و بێگوێی خوداوەند دەکات‌و ئـاینی دەشـێوێ‌و تێکدەچـێ، ئەگـەر نەخۆشـبوو ژیـانی بەسەردەچـێ‌و زوو دەمرێت.

*بەربوونـەوەی بـەرد لەئاسمانـەوە بۆسەر زەوی یـان کـەوتنی بەسـەر زانـا یـاخود مزگەوتەکاندا پیـاوێکی دڵڕەقـە یـاخود باجێکـە دەسـتەڵاتدار لەسـەر خـەڵکی ئـەو نـاوەی دادەنـێ مەگـەر پێـشبینی کوشـتار بکـەن ئـەوجا ڕووداوێکـدەبێ ئـەوجا ناڕەحـەتی‌و ناخۆشی ڕوو لەخـەڵکی جێنـشینی ئـەو ناوچەیە دەکات.

بـەڵام ئەگـەر بـەردەکان پارچەپارچـە بـوون‌و هـەر پارچـەیەك کـەوت بەسـەر شوێنێکدا بەڵگەیە لەسـەر دابەشـبوونی بـــەڵاو نەهامـــەتی‌و هەرکەســـێك پارچەبەردێك بکەوێتە ماڵەکەی پـشکێ لەو ناڕەحەتی‌و بەڵایەی بەردەکەوێ.

*ئەگـــەر خـــەڵکی لەنەبونیـــدابوون‌و چـــــاوەڕێی بەردەوامییانـــــدەکرد لەدەرەنجامەکەی دەترسان ئەوجا بەرد ناڕەحەتییـە ڕوو لـەو شـوێنەدەکات بەئەندازەی مەزنی بەردوتوندی.

*ئەگەر بەردی گەورەبوو لەئاسمانـەوە تێیـانگیرا سـزاو خەشمـە لەئاسمانـەوە دەگیرێتە ئەو شوێنە، چونکە خوداوەند فیلەوانـەکانی کوشـت کـاتێ باڵنـدەکان بەردەبانیانکردن، ئەمەش یـا نەخۆشـی یاخود هەڵمەت یا زیان یاخود تاڵانییـەو ڕوویان تێدەکات.

*(نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا ژنـانی بـــەئارام‌و دانبـــەخۆداگرن‌و بەڵگەیـــە لەسـەر سـووربوون لەسـەر کارێـك‌و تەمەندرێژی.

*هـەروەها بەڵگەیـە لەسـەر ئـاژەڵ‌و ساختمان.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسـەر لـەبیرکردن‌و پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ﴾ (الكهف: ٦٣).

*هـەروەها بەڵگەیـە لەسـەر خراپـەو داوێنپیسی.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەرئەوەی پێـی نـاوزەد دەکـرێ یـان بـەدخوە لەبنەڕەتدا.

*ئەگەر بەرد بەڵگەبوو لەسەر پلەوپایە زۆر دەخایەنێت.

*ئەگـەر بەڵگـەبێت لەسـەر هاوسـەر بەئارام‌و ڕازیدەبێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی کەلێی دروستدەکرێ وەك پەیکەرو...
*ئەو بەردانەی لەسەر شاخە گوزارشت لەپیاو دەکاتو لانەوماڵیان هەیەو هەموویان دڵڕەقن.
*ئەگەر بینی لەسەربەردێك هاتەخوارەوە یاخود کۆشا لەگەڵ بەردێکدا لێکدانەوەی وەك چیا دەبێت.
*ئەگەر بینی بەردێك هەڵدەکۆڵێو چاڵیدەکات دەگەڕێت بەدوای بارێکداو بەدەستی دەهێنێت بەئەندازەی ئەو چاڵەی لەسەر بەردەکە دروستیدەکات.
*ئەگەر چیا پادشاو فەرمانڕەوابێت بەردو دارو درەخت دەستو پێوەندەکانیانن.
**بەرد بەشێوەیەکی رەها:** بەرد لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زەوی یان دیوارێك ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+مردوو.
+خەڵکی دڵڕەق.
+بێئاگایی‌و بێکاریی.
*ئەگەربینی بوە بەخاوەنی بەردو کرییەتی یاخود وەستاوە لەسەری زەفەر بەپیاوێکدەبات یان هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکدا دەکات لەسەر شێوەی خۆی.

*ئەگەربینی بوە بەبەرد سەرپێچی خوداوەند دەکاتو دڵڕەق دەبێتو ئاینی تێکدەچێو دەشێوێ، ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێت، وەگەرنا ئیفلیجی لێیدەداتو سەرجەم جموجوڵەکانی دەوەستن.
*کەوتنەخوارەوەی بەرد لەئاسمانەوە بۆسەر زەوی یاخود بەردبارانی مزگەوت پیاوێکی دڵڕەقە یاخود سەرانەیەکە فەرمانڕەوای ئەو سەردەمە دەیخاتەسەر خەڵکی، ئەگەر بەردەکە شکا پارچە وردەکانی پەڕین بۆ ماڵانی ئەو دەوروبەرە بەڵگەیە لەسەر بڵاوونەوەی بەلاو نەهامەتی بەسەر خەڵکی ئەو سەردەمەدا هەرکەسێك پارچە زیخو بەردێك بچێتە نێو ماڵی بەلاو نەهامەتیەك رووی تێدەکات.
*ئەگەر خەڵکی لەنەبوونی‌و قاتو قڕیدابوون دەترسان لەدەرەنجامەکانی بەلاو نارەحەتیە روو لەو ناوچەیە دەکات بەپێی گەواهی ئەو بەردەو توندی‌و بەهێزی.
*ئەگەر بەردەکان زۆربوونو خەڵکی بەردەبارانکران سزایەو لەئاسمانەوە دادەبەزێت، دەگونجێت بەلاو نەهامەتی بێت یاخود کولله یا سەرماو رەشەباو

غەرامەو هەڵمەتو تاڵانیو هاوچەشنی ئەوانەبێت.

*ئەگەر ببینی بەرد یاخود شاخ دەگوێزرێتەوە هەوڵی کارێکی ئەستەمو گران دەدات.

*ئەگەر ببینی سواری بەردێکبوە ئەگەر رەبەنبوو هاوسەر دەگرێ.

*ئەگەر ببینی بەردێك گیراوە لەگەرووی غەمو پەژارەو خراپە رووی تێدەکات.

*ئەگەر ببینی بەکۆچانێك دەکێشێ بەبەردێکداو ئاوی لێدێتە دەرەوە ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت ، ئەگەر دەوڵەمەندیشبوو سامانو ماڵو دارایی زیاد دەکات ، دەگونجێت رزقو رۆزییەکی هێواش بێت.

*دەگونجێت بەرد بەڵگەبێت لەسەر:

+بەندەوخواناسان.

+دنیانەویستو دڵ ملکەچان.

*ئەگەر ئەو پادشایە بینی بەردی لایە بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی ماڵوسامانی بەهۆی بەردەوە.

*ئەگەر خواناسێك بینی بەردی لایە کەرامەتی[1] دیاریدەدات لەوشارەو پێی دەبوژێتەوە، ئەگەر لەخەودا بەردێکی تێگیرا دەکەوێتە بەرشاڵاوی توهمەت

کەوا بێتاوانە لێی بەتایبەت ئەگەر بەردەکەی پەڕیو دوایکەوت.

*دەگونجێت بەرد بەڵگەبێت لەسەر کونو قوژبنی دڕندەو جانەوەر.

*بەردی ئاش بەڵگەیەلەسەر:

+زانایان.

+مندالآن.

+ژنو ماڵو دارایی.

*ئەگەر ببینی بوە بەخاوەنی بەردی ئاش بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندیو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا بەماڵو چەك.

*ئەگەر بوو بەخاوەنی بەردێك وەك بەردی ئاش یان بەردی گەورەو هاوڕێ یاخود بەردی نێو ئاوو هاوچەشنەکانی سوودو قازانجێکە لەلایەن شکۆمەندێك یان باوكو گەورەو مامۆستاو براو هاوسەرو خزمو هاوڕێو لایەکی نادیارەوە پێیدەگات، دەگونجێت پیاوێك بێت زۆر سەفەر بکات.

*ئەگەر بەردێکی هەڵگرتو زۆرماندوبوو بەدەستیەوە لەلایەن مرۆڤێکی دڵڕقەوە ئەشکەنجەو ئازار دەچێژێت بەئەندازەی سووکیو قورسی بەردەکە.

*بەردی بەسوودو کەڵك وەك بەردی سەوز کە بۆ چاوئێشەو گوێ ئێشە بەکاردێت بەڵگەیە لەسەر:

---

[1] کەرامەت: بەکاری لەرادەبەدەرو سەرسووڕهێنەر دەوترێت. (وەرگێڕ).

+پزیشك.

+زانا.

+شكۆمەندو پلەوپایەدار.

+پشووماندودەركردن.

+بژێوی‌و سوودو قازانج لەپیشەیەكی بەكەڵك‌و سوود.

**بەردساز:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر:

+نزیكی لەگەورە پیاوانەوە.

+جیاوازی‌و ناكۆكی خستنە نێوان كۆمەڵەوە.

*بەردساز پیاوێكە شارەزایە لەچارەسەركردنی دڵی رەقی گەورەپیاوان.

**بەردگرتنە نێو پشكۆو ئاگر:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بەردی گرتە نێو پشكۆ بەڵگەیە لەسەر قەرزو وامدانەوە بەئەندازەی حەوت درهەم یاخود حەوت دینار.

*ئەگەر پشكۆیەكی نێوبەرد بخوات ماڵ‌و دارایی هەتیو دەخوات.

*بەرد گرتنە پشكۆو ئاگر بەڵگەیە لەسەر قەرزو وام دانەوەو نوێژو رۆژوگێڕانەوە.

**بەردونەستێ:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی ئاگری كردەوە هەتا خۆی پێ گەرمبكاتەوە پەنادەگرێ بەپیاوێكی دڵڕەقی خاوەن دەستەڵات یان پەنا بۆ پیاوێكی دەستەڵاتداری بەهێز دەبات لەهەژاریداو سوودی لێوەردەگرێ، ئەگەر یەكانگیربوون ئەوە دەستەڵاتی فەرمانڕەوا دادەمەزرێت‌و بەڵگەیە لەسەری چونكە بەرد پیاوێكی دڵڕەقەو ئاسنیش پیاوێكی بەدەستەڵاتەو ئاگریش دەستەڵاتدارە.

*ئەگەر ژنێك بینی بەبەردو ئەستێ ئاگردەكاتەوە بەفوو و داگیرسا كوڕێكی دەبێت.

*ئەگەر بەردی لەبەردی دیكە هەڵسوو ئاگری لێكەوتەوە دووپیاوی دڵڕەق لەگەڵ یەكدی دەجەنگن بەتوندی‌و خەڵكی چاو دەبڕێتە كوشتارو پێكدادانیان چونكە بڵێسەی ئاگر كوشتارە بەشمشێرو گوتەو قسە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر ئاگر كرایەوە بەبەردو ئەستێ بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری كەسێكی رەبەن ئەگەر ئاگرەكە بەرزبووەوە هاوسەرەكەی دووگیاندەبێ‌و كوڕپاندەبێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شەڕو بەرەبەكانی لەنێوانیاندا یاخود لەنێوان دوو شەریكدا، ئەگەر جلێكی سووتاند یان لەش‌ولاری سووتاند زیان لەوماڵە دەكەوێت یاخود روو لەئابڕووی یان لەش‌و لاریدەكات.

*ئەگـەر قورئـانی سـووتاند یـان دەفتەرێکی سووتاند رەخنەو نکوولییە لەئایندەگیرێ.

**بـەردەباران:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: ئەگەر بینی بەردەبارانی مرۆڤێکدەکات قسەو جنێو بەو مرۆڤە دەدات.

*بـەردەباران جنێودانـە بـەئابرووی کەسێك مەگەر بەجێهێنانی سنورێکی خـوایی بێـت ئـەوجا بەڵگەیە لەسـەر پاکێتی لەگوناهو تاوان.

**بـەردە رەشـەکەی (کابـە):** (ئـیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی دەستدەدات لەبـەردە رەشـەکە پابەنـد دەبێـت بەپێـشەوایەکی خـەڵکی حیجـازەوە، ئەگـەر بـەردە رەشـەکەی دەرهێنـاو بەتایبـەت بۆخـۆی بـرد لەئاینـدا بیدعەیەك دروستدەکات.

*ئەگـەربینی بـەردە رەشـەکە دەدۆزێتـەوە دوای ئـەوەی خـەڵکی لەدەسـتی دەدەن لەشـوێنی خۆیـدا دایدەنێت ئەمەش خەوی کەسێکە وا دەزانێـت لەسـەر رێنماییـەو سـەرجەم خەڵکیش وێڵو سەرگەردانن.

(نابلـسی)دەڵێـت: بەردەرەشـەکە لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر (حـەج)، ئەگـەربینی بەردەڕەشـەکە دەشـکێنێ دەیەوێت خەڵکی هەموویان لەسەر رای خۆی کۆبکاتەوە، دەگونجێت بەڵگەیە لەسـەر ئـەو زانیارییـەی بەتـەنیا ئـەو دەیزانێو دەیشارێتەوە.

*ئەگـەر بینـی قووتیـدا خـەڵکی وێڵو سەرگەردانی دەکات.

*ئەگـەر تەوقـەبکات لەگـەڵ بـەردە رەشەکە (حەج)دەکات.

**بـەردی ژێـر مەنجـەڵ:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بـەردی ژێـر مەنجـەڵ لەخـەودا نەفسی پیاوە، هـەروەك چۆن مەنجـەڵ بـەهۆی ئـەو بەردانـەوە راگـیر دەبێـت نەفس بەهۆی ماڵو سامانەوە دەژێت.

**بـەردی مەنجـەنیق:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بـەردی مەنجەنیق نوێنـەرێکی دڵڕەقە ، ئەگەربینی بەردێك هەڵدەدات لەشـوێنێکی بـەرزەوە دەسـتەڵاتو فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت.

*ئەو بەردانەی لەسەر شاخو دامێنیەتی پیاوانی دڵڕەقن لەئایندا.

*ئەگەربینی بەردێك هەڵدەگرێت لەگەڵ پاڵەوانێکـدا دەجـەنگێ کـەوا بـەهێزو دڵڕەقـە، ئەگـەر هـەڵیگرت پێـی دەوڵەمەنـد دەبێـت، ئەگـەر نـەیتوانی دەبـەزێ، هـەر لەسـەر ئەمـەش یـاری هەڵگرتنی ئاسن لێکدەدرێتەوە.

*پیاوێـك لەخـەودا بینـی وردە بـەرد کەوتوەتـە گوێـچکەی‌و بەترسـەوە

دەریهێناو فڕێیدا، خەوەکەی بۆ (ئیبن سیرین)گێڕایەوەو ئەویش وتی: پیاوێکی بیدعەچییە ، گوێی لەقسەیەکی ناخۆش‌و ڕەق دەبێت‌و گوێچکەی دەزرنگێتەوە.
*ئەگەر بینی ژنان بەردی تێدەگرن سیحرو جادووی لێدەکەن .
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی بەردێك دەگرێتەسەری سەرۆکێکی هەیە هانای بۆ دەبات‌و پشتی پێدەبەستێت‌و جێگەی ئومێدو متمانەیەتی.
*ئەگەربینی بەرد لەهەموولایەکەوە هەڵدەدات لەسەر شاخێکی بەرزەوە دەگات بەدەستەلآت‌و ستەمدەکات.
**بەردی هەڵکۆڵراو:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینایکرد خشتی سوور بەلگەیەلەسەر:
+شکۆمەندی‌و ڕووتێکردن.
+ئومێد درێژی.
+دڵنیابوون لەماڵ‌و منداڵ.
*ئەگەر خشتی لەجێگەی بەردی هەڵکۆڵراو بەدیکر بەلگەیە لەسەر:
+ڕسوایی‌و لەکیسچوونی پلەوپایە.
+گۆڕانی هاوسەر.
+مردنی خاوەن بیناکە.
*هەروەها خشتی سوور ئەگەر لەجێگەی خشتی ئاسایی بینای پێدروستکرا یاخود لەجێی بینای قڵیشبردوبوو بەڵگەیەلەسەر بەرزی‌و بڵندی ڕزق‌وڕۆزی.
*ئەگەر چوارچێوەی دەرگا لەبری ئەوەی لەبەرد دروستکرابێت لەمەڕمەڕبوو ملکەچی‌و ڕسواییە ، هەروەها ئەگەر کۆڵەکەو پایەی بەردین بوو بەکۆڵەکەو پایەی مەڕمەڕ بەهەمان شێوە دەبێت.
*ئەگەر گۆڕی مەڕمەڕی بوو بەگۆڕی بەرد بەلگەیە لەسەر گۆڕانی حاڵی ئەوەی مردوو بەوەقف‌و ڕام بەجێیهێشتوە یان گۆڕانی حاڵ‌و باری میراتگرانی.
**بەرزی( بالآیی ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا نزمی پلەوپایەیە بۆیەکێك بیەوێت بەرزبێتەوەو ڕێنمایدەربێت لەنێو خەڵکیدا.
**بەرکۆش( بەرگە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵ‌و سامان گومناوییەو بۆئەوەی چاوەڕێی منداڵی نێرینەیە کورەو بردنی‌و هەڵگرتنی بەلگەیە لەسەر هاوڕێ‌و دووڕوو.
**بەرگ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا هاوسەرە یان ژنێکی بێمێردە، هەروەها کوڕێکی کەودەنە هیچ جموجووڵێکی نییە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا جیاوازە بەپێی جیاوازی جۆرو ڕەنگو ڕەگەزی.

*ئەگەر ژن بەرگی پیاوی بینی چاکەیە بۆی لەئاین‌و دنیادا، ئەگەر جل‌وبەرگی جەنگی پۆشیبوو لێکدانەوەی بۆ هاوسەرەکەی یان بژێوی پەیداکاری دەبێ.

*ئەگەر پیاوێك بینی جل‌وبەرگی ژنانی لەبەردایە غەم‌و پەژارە ڕووی تێدەکات لەگەڵ ترس‌و بیم‌و ملکەچی پاشان هەمووی دەڕەوێتەوەلێی.

**بەرگ تێکر:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری ڕەبەن‌و دووگیانبوونی ژن.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر شاردنەوەی کاروبارو پاراستنی نهێنی‌و ماڵ‌وسامان.

**بەرگتێگری کتێب:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شۆرەرو کفندروو ئەسپەردەکاری مردوو.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر شاردنەوەی نهێنی‌و پاراستنی خۆشەویستی‌و تەبایی.

**بەرگتێگیراو(بەرگ):** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر کتێبەکانی تەفسیری بینی کاروباری جێگیردەبێ. ئەگەر کتێبە بەرگ ڕەقەکانی بینی خێری دەستگیردەبێ.

*ئەگەر کتێبە بەرگ ڕەقەکانی هەواڵی بینی لەلای بەرپرسەکان نزیکدەبێتەوە.

*دەگونجێت کتێبەبەرگ ڕەقەکان ڕەوانبێژی بێت‌و خۆی سەرقاڵبکات بەکاروباری سەیرەوە.

**بەرگدروو:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەرگدروو پیاوێکە ڕێکخەرو چاکەکارەو فەڕو خێری دادەبارێت بەسەر ڕێزدارو بێڕێزدا، لەسەر دەستی ئەو کاروباری پەرت‌و ئاڵۆز یەکدەگرێ.

*ئەگەر بەرگی بۆ خۆی دووری دنیای خۆی باشدەکات بەئاینداری.

*ئەگەر بینی خەریکی درومانە بەڵام بەباشی نایزانێ دەیەوێت کاروبارێکی پەرت‌و لەیەکدابڕاو کۆبکاتەوە بەڵام ناتوانێت.

*ئەگەر بینی جل‌و پۆشاکی ژنەکەی دەدورێت مەینەت‌و دەردەسەری ڕووی تێدەکات.

(نابلسی)دەڵێت: دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر:

+نووسەر یاخود پیاوێك خەریکی مارەبڕین بێت.

+گێڕانەوەی ئەوەی لەکیسیچوە یاخود ئەوەی لێی پەشیمان بوەتەوە.

**بەرگریکردن لەئابڕوو:** (نابلسی) دەڵێت: لەخودا بەڵگەیە لەسەر فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپەو بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی بۆ ئەوەی هەڵدەستێت بەوکارە.

**بەرنوێژی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر یەکێك بینی لەخەودا بەرنوێژی دەکات بۆ خەڵکی شایستەی پلەوپایەی دەستەلاتەو پاش وەرگرتنی پۆستی دەستەلات گوێڕایەڵی دەبن.

*ئەگەر بەرنوێژی بۆ خەڵکیکرد روو بەقیبلەو نوێژێکی تەواوی بۆکردن لەفەرمانڕەواییدا دادپەوەر دەبێت.

*ئەگەر بەپێوە نوێژی بۆ کردو ئەوان دانیشتبوون لەئەرکی سەرشانی بەرانبەر ئەواندا کەم و کوڕی نانوێنێت بەلام ئەوان کەم و کوڕی دەنوێنن بەرانبەری یاخود خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر بەڵێندان بەکۆمەڵێکی نەخۆش و ناتەواو.

*ئەگەر بەدانیشتنەوە بەرنوێژی بۆکردن و ئەوان بەپێوەبوون بەڵگەو نیشانەیە لەسەر کەم و کوڕی لەبەرانبەریاندا.

*ئەگەر بۆ کۆمەڵێکی دانیشتوو راوەستاو بەرنوێژیکرد کاروباری هەژارو دەوڵەمەند دەگرێتە دەست.

*ئەگەر بەپێوە بەرنوێژی بۆ کردن و ئەوان دانیشتبوون تاقیدەکرێنەوە بەخنکان یان دزینی جل و بەرگ و هەژارکەوتن.

*ئەگەر بینی بەرنوێژی بۆ ژنان دەکات کاروباری کۆمەڵێکی لاوازو زەبوون دەگرێتەدەست.

*ئەگەر لەسەر لا یان بەپاڵکەوتوویی بەرنوێژیکرد بۆ خەڵکی و جل و بەرگێکی سپی پۆشیبوو، خۆشی خەشم و قینی لەوشوێنەدەبێ، ئەگەر لەنوێژەکەشیدا قورئانی نەخوێندو (الله اکبر)ی نەکرد دەمرێت و خەڵکی نوێژی لەسەر دەکەن.

*هەروەها ئەگەر ژنێك لەخەودا بینی وەك ئەوەی بەرنوێژی بۆ پیاوان دەکات دەمرێت، چونکە ژن پێش پیاو ناکەوێت لەمردندا نەبێت.

*ئەگەر فەرمانڕەوایەك بینی بەرنوێژی دەکات بۆ خەڵکی لا دەبرێت و ماڵ و دارایی لەدەستدەدات.

*ئەوەی بەرنوێژی بۆ پیاوان و ژنان بکات پۆستی دادوەری وەردەگرێت لەنێوان خەڵکیدا ئەگەر شایستەی ئەو

کارەبێـــت ، وەگـــەرنا دەبێـــت بەناوبـژیوانو چـاکە دەکـات لـەنێوان خەڵکیدا.

*ئەوەی ببینێ بەرنوێژی تەواو دەکات بـۆ خـەڵکی دەسـتەڵاتی تـەواو دادپەوەرانە دەبێت بەسبەریانداو دوایـی دێت.

*ئەگـەر نوێژەکـەی بـڕی دەسـتەڵاتی بەسـەریاندا تـەواو دەبێـتو بڕیـارو وتەکانی جێبەجێ ناکەن.

ئەگـەر بەتـەنیا نوێـژی کـردو ئـەوانیش هەریەك بەتـەنیا نوێـژیانکرد دەرچـوون لـەرێ ، ئەگـەر بەرنوێـژی بـۆ نوێـژی سـوننەت بـۆ کـردن ئـەوا دەچێتە ژێـر پەرێزێك کەوا هـەرگیز زیانی پێناگات، ئەگەر ئەو خەڵکە کردبوویان بەپێشەوا میراتی بـۆ دەمێنێتـەوە بـەپێ ئایـەتی: ﴿وَنَجْعَلَهُـــمْ أَئِمَّـــةً وَنَجْعَلَهُـــمُ الْوَارِثِينَ﴾(القصص:٥).

*ئەگـەر ببینـی بەرنوێـژی بـۆ خـەڵکی دەکـاتو بەباشـی قورئـان ناخوێنێـت داوای شتێکی لێدەکرێت نایدۆزێتەوە.

*ئەوەی بەرنوێـژی بـۆ کۆمـەڵێك بکـات لەسـەربانێك ئـەوا بـاش دەبێـت بـۆ خـەڵکیو بـەو هۆیـەوە ناوبـانگ دەردەکات لەرێی قەرزو خێرەوە.

(نابلـسی) دەڵێـت: پێـشەوا لەخـەودا دەستەبەرو جێگرە، دەگونجێت ببینێ بەڵگـەبێت لەسـەر تـرسو بـیم ، یـان بەڵگـــەبێت لەســـەر پلەوپایـــەو پێـشکەوتنو فـەرمان بەچـاکەو رێگـری لەخراپە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگـەبێت لەسـەر بەربەستو باوكو دایكو مامۆستایان.

*ئەگـــەر لەخـــەودابوو بەپێـــشەواو بەرنوێــژیکرد بۆیــانو رووی کردبــوە قیبلـە بەدەسـتنوێژێکی تـەواوەوە بـێ زیادوکـــەم شایـــستەی دەســـتەڵاتبوو دەستەڵات بەدەستدەهێنێت.

*دەگونجێــت خــۆی بخاتــە ئاســتی بـەرپرسو وەکیـلو دەستەبەرەوە بـۆ کۆمەڵێك یان هاوبەشی کۆمـەڵێك بکـات خوازیاری خێرو چاکەبێت لێیان.

*ئەگەر بەرنوێژی بۆ خـەڵکیکردو رووی نـەکردە قیبلـە ناپـاکی دەکـات لەگـەڵ هاوەڵانیو بیدعە دادێنێتو دەگونجێت کـارێکی نـاڕەوا ئەنجامبـدات خـەڵکی داوای لێبکەن.

*ئەوەی ببینێ فەرمان دەکات بەسـەر کۆمەڵێکـدا بەنوێـژکردن دەسـتەڵاتێك دەگرێتە دەست دادپەوەر دەبێت تێیدا دوای ئـەوەی روو بەقیبلـە دەوەسـتێو نوێژەکـەی تـەواو دەکات یـان فـەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە دەکات.

*ئـەوەی ببینــێ بەرنوێژیـدەکات بـۆ کۆمەڵێکی نادیار لەشوێنو جێگەیـەکی نادیـارو نازانێت چیان بـۆ دەخوێنێت ڕێزدارکردنیـــەتی بــەمردن چـــونکە بەکەڵکی پێشەوایەتی نایەت.
*ئەگەر ژنێك بینی بەرنوێژی بۆ پیاوان دەکات دەمرێت چونکە نابێت بەرنوێژی بـۆ پیـاوان بکـات ، ئەمـەش ناگونجێت مەگەر لـەکاتی مردنـدا نـەبێتو پیـاوان نوێژی لەسەردەکەن.
*ئەگەر پیـاوێکی عەجـەمی کەبەباشـی نوێژ نازانێتو قورئانی ڕەوان نییە بینی بەرنوێژی دەکات بۆ کۆمەڵێك بەهـەمان چەشنی پێشووە.
*ئــەوەی ببینــێ بەرنوێــژی بـــەپێوە دەکات بۆ کۆمەڵێكو دانیـشتوون کـەمو کـــوڕی نانوێنێــت لـــەمافو ئـــەرکی سەرشانیدا بەرانبەریان، یان خەوەکەی هێماو نیشانەیە لەسەر بەرپرسیـارێتیو بەڵێندانی بەگرۆهو کۆمەڵێکی نەخۆش.
*ئەگەر بینی نوێـژدەکات بێڕاسپاردنی کۆمـــەڵێکی لاواز لەســـەر لا ، یـــان بەپاڵکـــەوتووییو جـــلو بــــەرگێکی سـپیەوە لەشـوێنی خـۆی دەبێتـەوەو لەنوێژەکەیـدا قورئـان ناخوێنێـتو (الله اکبر) ناکاتو دەمرێتو خـەڵکی نوێـژی لەسەر دەکەن.
*ئەگەر پێـشەوایەك بینـی وەك ئـەوەی بەرنوێــژی بــۆ خەڵکیــدەکات لــەکار دەخرێتو ماڵو دارایی لەکیسدەچێت.
*ئـەوەی بەرنوێـژی بـۆ پیـاوانو ژنـان بکـــات پۆســـتی دادوەری لـــەنێوان خەڵکیـدا بەدەسـت دەهێنێـت ئەگـەر شایـستە بێــت، وەگـەرنا چاکـسازیو ئاشتەوایی نێوان خەڵکی پێدەدرێت.
**بەروبووم:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەو بەروبوومـــەی وادەیـــەکی دیـــاریکراوی نەبێتو تێکنەچێت وەك خورمـاو مێـوژ باشــــــە، ئەوەشــــــی لــــــەکاتێکی دیاریکراودابێتو لەکاتی خۆیدا باشبێت باشـە مەگـەر یـەکێك نـاوێکی خـراپو نـاقۆڵای هـەبێت لەدەرەنجامـدا خـراپو ناباشـە، ئەوەشـی بناغەیـەکی خراپـی هـەبێت ڕوو لەغـەمو پەژارەکردنـە یـان لەکاتو وادەی خۆیدا نەبێت نەخۆشیە وەك هـــەنجیر ، چـــونکە (ئـــادەم) ـــ سـەلامی خـوای لەسـەربێت ـ بەگـەڵای هەنجیری خۆیداپۆشیوەو لای ئـەوداره سەرزەنشکراو ناخۆشـی غـەمو پـەژارە دایگرت.

*ئەوبەرووبوومــەی رەنگــی زەردبێــت نەخۆشییە وەك بـەهیۆ گۆیـژو كاڵـەك. وێڕای زەردیشی لەكاتی خۆیدا نەبێت.
*ئەگەر ئەو بەروبوومە ترشبوو بیخوات تووشی لێداندەبێت.
*ئەوبەروبوومەشـی ناوەكـەی باشـبێت باشی لەناوەكەیەوە وەردەگریۆ.
*هەروەها بەهێی سەوز لـەكاتی خۆیـدا نەبێت ماندوێتیو نەخۆشییە.
*هەموو بـەروبوومێكی شـیرینو خـۆش بەدەر لەوەی زەردبێـت یـان ترشـبێتو لەكاتی خۆیدا نەبێت رزقو ماڵو دارایییە مانــەوەی ئــەو رزقــەش بەئەنـدازەی مانــەوەی ئــەو بەروبوومەیــە، خێرایـی پێگەیــشتنی بــەدەر لــەترێی رەشو هــەنجیر باشــە چونكە ئەودووانــە بـاش نیین.
*ئەگـــــەربینی بـــــەروبوومێكی بەدەستهێناوە هیـچی تێـدا نییـە گـەر لەكاتی خۆیدابێت.
*ئەگـەر واهەسـتیكرد ئـەو بەروبوومــە لەبەروبوومــەكانی بەهەشـتە زانیـاریو ئاینـــە، وەگـــەرنا بەوچەشـــنەیە كەباسمانكرد.
*بـەروبوومی سـەوزیش لـەكاتی خۆیـدا نــەبێت بەڵگەیــە لەســەر رزقو مــاڵی حەرام ئەگەر نموونەو بەڵگەی لەگەڵبوو لەسەرئەوەی زیان نییە لەدنیادا.
(نابلـــــسی)دەڵێـــــت: خـــــواردنو خاوەندارێتی بەروبووم بەڵگەیـە لەسـەر ئـاین یـاخود زاڵبـوونی ژنـانو پیـاوانی بێدەســتەڵاتو خزمــەتكارو لاڵوكــەم دواون.
*بــەروبوومی خــۆشو وبــەتام رزقو رۆزییــــە بەمانــــدوبوونو شــــەكەتی بەدەستدێت.
*بــەروبوومێك بەئەنـدازەی گــەدەبێت رزقو رۆزییە كـەمێك گومـانی لـەدەورە یاخود زەكاتی دەرنەكراوە.
*ئەو بەروبوومەشی ناوكو توێكڵی نییە بەڵگەیە لەسەر كارئاسانی لەگـەڵ رزقو رۆزی حــەڵاڵ لــەكاتو وادەی خۆیــداو پێگەیشتنی خێرێكی كتـوپڕو خێرایـە ، خۆئەگــەر لــەكاتی خۆیــدا نــەبوو ســـــــوودێكە دوای ماوەیـــــــەك بەدەستیدەهێنێت بەپێی نزیكی وادەی ئەو بەروبوومە.
*بینینی بەروبووم لەكاتی خۆیدا نەبێت بەڵگەیـــــە لەســــــەر رزقو رۆزی، خواردنیــشی لــەكاتی خۆیــدا نــەبێت لەكیســـچوونێكی بـــاشو چـــاكەو ئاســـانكردنی كـــاری قورسوگرانــــەو

گێڕانــەوەی ئەوەیــە کەترســی لێــی تیابچێت.

*هەموو بەروبوومێکی کۆکراوە بەڵگەیە لەســـــەر تـــــەبایی‌و کۆبوونـــــەوەو بەپێچەوانەشەوە.

*هەموو بەروبوومێکی نامۆو غـەریبیش بەڵگەیـە لەسـەر وڵاتەکـەی‌و کـارکردن تێیدا.

*بەروبوومــەکانیش ژنـان یـان منـاڵ یــاخود مـــاڵ‌وداراییی یـــان شـــوێنی بـــەکرێگیراو یـــان زانیـــاری‌و کـــاری بەسوودو چاکە یا خزم‌و کـەس‌وکارو خۆشـی‌و چـاکبوونەوەیە لەنەخۆشـی بۆیەکێك ببێت بەخاوەنی.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەرئەوەی شەربەتی لێدروستدەکرێ.

*ئەگـەربینی لـەدارێك بـەروبومێکی تـر لێدەکاتــەوە لەرەگــەزی خــۆی نییــە لەسەر کارێکە دروست نییە بۆی یاخود داواکاری شتێکە بۆی نایەتەدی.

*لێکردنــەوەی بــەروبوومێك لــەرەگو ریشاڵی دارەکـە دەنگدابڕین‌و دژایـەتی پیاوێکی ڕێزدارە.

*ئەگەر بینی لەچەندین دار بـەروبوومی جیـاواز جیـاواز لێدەکاتـەوە زانیـاری‌و شـاوروفیقەی مەترسـیدارەو وەرگرتنـی زانیارییە.

*ئەگـەر دارێکـی بەروبومـداری بینـی لەزســتانداو بــەدڵیبوو پیاوێکــە رووی تێـدەکری‌و وادەزانرێـت خـاوەن مـاڵ‌و داراییە ، ئەگـەر لێیکـردوە بەئەنـدازەی ئەو ماڵ‌و داراییە ماڵ‌وسامانی دەچێت بــەلای ئــەو پیــاوەدا، ئەگــەر لێــی نەکردەوە قایل دەبێت بەحاڵی خۆی.

*بەروبووم ماڵ‌وداراییی‌و ڕێزە ، ئـەوەی لـەدارێك بـەروبوومێکی تـر لێبکاتـەوە بەڵگەیـە لەسـەر زاوایـەکی بـاش یـان شـەریك‌و هاوکارێـك تووشــی شـادی‌و خۆشـحاڵی دەبێـت لێـوەی‌و بـەرووی شـــاخیش ڕزق‌و ڕۆزی‌و زانیـــاری‌و بەهرەی خواییە.

**بەرەبــەیان**[1]: (نابلــسی) دەڵێــت: ئـەوەی لەخـەودا بیبینـیٚ دەگونجێـت جادووی لێبکریٚ.

*دەگونجێــت بکەوێتــە نێــو گونــاهو تاوانـــــەوەو پێویـــــستی بـــــەداوای لێخۆشـبوون هـەبێت بـەپێی ئایـەتی: ﴿وبالأســحار هــم يــستغفرون﴾ (الذاريات: ٢٨).

**بـەڕاکردن ڕۆیشتن**: (نابلسی) دەڵێـت: ئەگەر لەخەودا بەدیکرد بەڵگەیە لەسەر بژێوی پەیداکردن بۆ ماڵ‌و منداڵ.

---

[1] **بەرەبەیان**: (سحــر) : بـــەرەبەیانی شەو کۆتاییەکەیەتی . (نابلسی).

**بەڕوو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڕوو پیاوێکی قورسی دەوڵەمەندە، ماڵی کۆکراوەیە، دارەکەشی پیاوێکی دەوڵەمەندە، لەبەرئەوەی بەڕوو زۆر دەخورێتو بەڵگەیە لەسەر ڕژدی، هەروەها بەڵگەیە لەسەر بەندایەتی.

(نابلسی) دەڵێت: بەڕوو دڵتەنگیو سەفەرە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نێربازی شابەڕووش مرۆڤە رەشپێستەکانە.

**بەڕوواکەوتن:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر شاردنەوەی نهێنی.

**بەڕە( ڕاخەر):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڕە لەلێکدانەوەدا وەك ڕاخەر وایە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەخەودا بینیم لەسەر بەڕەیەك بووم (یەزید)ی کوڕی (عەبدولمەلیك) هاتو بەڕەکەی لەژێردار ڕاکێشامو فڕێیدا ، پاشان لەسەر زەوی دانیشت. (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەم خەوە هی تۆنییە لەوانەیە (یەزید)ی (مهلل) بینیبێتی ئەگەر خەوەکەی ڕاست بێت (یەزید)ی کوڕی (عەبدولمەلیك) دەیبەزێنێ.

**بەزەیی( سۆز):** سەبارەت بەبەزەییو سۆز ئەگەر بینی بەزەیی بەکەسێکی لاوازدا دێتەوە ئاینی بەهێزو دروستدەبێ بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ): "ئەوەی گەورەمان بەڕێزدار نەزانیو بەزەیی بەهەژارماندا نەیەتەوە لەئێمە نییە"[1].

*ئەگەر بینی بەخشراوەو بەزەییان پێداهاتوەتەوە خوداوەند لێی دەبورێت.

*ئەگەر بینی سۆزو بەزەیی خوداوەند دادەبارێت بەسەریا نازو نیعمەت بەدەستدەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ اللهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ﴾ (النور:١٠)ئەمەش نازو نیعمەتە.

*ئەگەر بینی بەسۆزو بەزەییە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزی پێدەبەخشرێ بەپێی ئایەتی: ﴿قُلْ بِفَضْلِ اللهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا﴾ (یونس:٥٩): لەراقەی وشەی (رحمة ـ سۆزو بەزەیی)لەم ئایەتەدا وتراوە: مەبەست پێی قورئانی پیرۆزە.

**بەژنو بالای مرۆڤ:** (نابلسی) دەڵێت: درێژی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر فتنەو ئاشوب، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر

---

[1] (ترمذي)(١٩٢٠)و(ئەحمەد)لە(مسند)(٦٦٩٤)لە ڕێگەی (عمرو)ی کوڕی (شعیب)و ئەویش لەباوکو باپیرییەوە .

رژدی‌و خـــۆ نوانـــدن بـــەتواناداری‌و دەستەلات.
*بـالای درێـژ خێـری تێـدا نییـە ئەگـەر کورتبـــوەوە ئـــەوجا بەلگەیـــە لەســـەر دابـــەزینی پلەوپایـــە یـــاخود نزیکـــی چارەنووس.
*ئەگـەر بـەژن‌وبالای بینـی درێـژبوە لەئەنـدازەی خـۆی زیـاتر چـارەنووس‌و ئەجـەلی نزیکدەبێتـەوە بـەهۆی نزیکـی لەئاسمانـــەوە یـــاخود پلەوپایـــەی دادەبەزێ.
*ئەگـەر کۆشـکێکی بەئەنـدازەی بـالای خـۆی بینـی‌و خـاوەن دەسـتەلاتبوو لادەبـرێ یـاخود داواکـەی رێگـری بـۆ دروستدەبێ.
*کورتی بالا نەتوانینی دادگـایی یـاخود دادوەرییە.
*هـــەروەها بـــچووکیش زالبوونـــە لەجەنگدا لەگـەل بەربـەرەکانی چـونکە بچووکی ملکەچی‌و رسواییە.
*بـــەرزی بـــەژن‌و بـــالا بـــۆ کەســـێك خوازیـــاری دەســـتەلاتبێ گەیـــشتنە بەهیواو ئاواتی خۆی.
**بـەش ( پـشك )** : (نابلـسی) دەلێـت: لەخـــەودا بەلگەیـــە لەســـەر نامـــەی کردارەکان بەپێی ئایەتی: ﴿عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ الْحِسَابِ﴾ (ص:١٦).
*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر:
+دزی.
+زینا.
+بێوەفای.
+گوێهەلخستن‌و چاوداگرتن.
*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر منـدالێك لەزیناوە ببێت‌و منـدالێك بـاوك‌و دایکـی نەناسراوبن.
*بەلگەیە لەسەر مرۆڤـی نـەرم‌و نیـان‌و قـسەشیرین، ئـەوەی حـەز لەسـەماو خۆبردنە نێو دلی خەلکیدەکات، وێـرای ئەوە خۆی دادەگرێ‌و کاتێ هەلێکی بـۆ رەخسا باروحالی ئاسایی تێکدەدات.
**بەفر( سەهۆل)**: (ئیبن سیرین)دەلێت: بـــەفرو ســـەهۆل‌و تـــەرزە : هەریـــەك لەوشتانە بەلگەیە لەسەر :
+رووداو.
+نەخۆشی ئاولە.
+ئاوبەنگ.
+سزاو تۆلە لەو شوێنەی تێدا باریوە.
*بەردو ئاگریش وایە چونکە کشتوکال‌و بـــەروبووم تێکـــدەدات‌و کەشـــتی دادەگـرێ‌و زیـان بەهـەزار دەگەیـەنێت لەســـەرماو گـــەرماداو هەنـــدێك

لەزیندەوەرانیش تووشی نەخۆشی دەکات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر فەرپیت و دەوڵەمەندی و زۆر خۆری.

*داپۆشینی سەرزەوی بەبەفر لەشوێنی کشتوکاڵ یان لەکاتی سوودو قازانجدا بەڵگەیە لەسەر زۆری گوڵی سپی و سوودو فەری پڕ پیت لەخواردن و روەك وەك پڕبوونی بەبەفرو سەهۆڵ.

*ئەگەر لەکاتێکدابوو هیچ سوودێکی نەبوو بۆ زەوی و روەکەکەی بەڵگەیە لەسەر ستەم و زۆرداری دەستەلأتدار.

*هەروەها ئەگەر بەفر لەکاتی سوودلێوەرگرتن یان هەرکاتێکی تردابوو ستەم و زۆردارییە یان بەلاو نەهامەتییە روودەکاتە کۆمەڵ یان ماڵ وسامانیان بەپێی زیادوکەمی بەڵگەکان، هەروەها ئەگەر بەفری بینی بەلأم لەشوێنی خۆیدانەبوو وەك نێوماڵ و دوکانەکان سزاو خەشم و تۆڵەو نەخۆشییە یان مەرگو سزایە دێت بەسەریاندا.

*ئەگەر داباری بەسەریاندا بەڵگەیە لەسەر گەمارۆو گرێ و کۆسپ کەوتنە سەفەرەوە یان بژێوییەوە. سەهۆڵ و بەفریش هەروایە چونکە خێری تێدا نییە ، دەگونجێت لەشەیتان یان فریشتەوەبێت.

(نابلسی)دەڵێت: دەگونجێت بەفرو ئاگر بەڵگەبێت لەسەر خۆشەویستی چونکە ئاگر بەفر ناتوێنێتەوەو بەفریش ئاگر ناکوژێنێتەوە.

*ئەگەر بەفر لەکاتی خۆیدا بینرا بەڵگەیە لەسەر رەوینەوەی غەم و پەژارەو ناچارکردنی دوژمن و ئێرەیی‌بەران، بەلأم ئەگەر لەکاتی خۆیدانەبوو بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی و گێژی و ئیفلیجی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پەککەوتنی سەفەرو خۆشحاڵی و نامەیەك هەواڵی خۆشی لەخۆ گرتبێت.

*بەفری زۆرو زاڵبوون سزایە لەلایەن دەستەلأتدارانەوە بۆ ژێردەستەکان و بردنی ماڵیان و رەق‌وزبری گوتاری لەگەڵیان بەپێی ئایەتی:﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزاً مِنَ السَّمَاءِ﴾ (الأعراف:١٦٢).

*ئەگەر بەفر لەزستان و هاویندا لێیدا هەژارییە.

*ئەگەر چاڵەبەفرێك بکڕێ لەهاویندا ماڵ و داراییەك بەدەستدەهێنێت و لێی دەحەوێتەوەو بەدوعاو گوفتاری باش هەست بەپشوودەکات.

*ئەگەر ئەو بەفرە زیانی پێگەیاندن و نەتوایەوە ماندوبوون و غەم و پەژارەیە و بەخێرایی دەڕەوێتەوە.

*ئەگەر بینی زەوی بوە بەکێڵگەیەکی وشك و تێدا بەستیاننەوە وەك باران ڕەحمەت و سۆزو میهرو فەڕوپیت دێت بەسەریاندا ، ئەگەر بەستی دەبێت بەقەڵغان لەبەر سەرماو قورس و گران نابێت لەسەری و پیاوێکی بەتواناو دەستەڵات دەبێت و ناترسێ.

**بەفرفرۆش:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەهاویندا بەڵگەیە لەسەر خۆشی و شادی لەزستانیشدا غەم و پەژارەیە.

**بەفیزەوە ڕۆیشتن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەفیزەوە ڕۆیشتن هەڵەوکەم و کوڕییە لەئایندا بەبەڵگەی ئایەتی ﴿واقصد في مشيك﴾، هەروەها بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەو ڕێزداری لەدنیادا کەبەزوویی پێیدەگات.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ماڵ و دارایی هەبوو تەماشادەکات ئاخۆ چۆن پەیدای کردبێت.

**بەلەسە( جەردە ـ دەست سپی ):** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەو جادووگەرەی بەوتە فروفێڵ و جادوو لەمرۆڤدەکات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دزی و چاوبەست و بەفیڕۆدانی ماڵ و دارایی.

**بەلەمی بچووك:** بەڵگەیە لەسەر خواناسی و دنیا نەویستی و کوڕو خزمەتکارو سەفەرو دین و دنیا.

**بەلاو کارەسات:** (ئیبنس یرین) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەرچوون لەگوێڕایەڵی و سزایە بەپێی ئایەتی: ﴿افأمِنُوا أنْ تَأتِيَهُم غَاشِيَةٌ مِنْ عَذَابِ اللهِ﴾ (یوسف).

*ئەگەر لەخەودا بەلاو کارەسات ڕووی تێکرد دەبێت بەدەستەڵاتدار ئەگەر شایستەبوو.

*بەلاو کارەسات ماڵ و دارایی یا خزمەتکار یاخود ژنە.

**بەلاو نەهامەتی:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شایی و ئاهەنگ و خۆشی و شادیی دوای ناخۆشی.

هەروەها دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا بەلادارە گوناهێکی ئەنجامداوە لێی پاشگەزە. ئەگەر بینی بەلاو نەهامەتی لەسەر لاچوو تەوبە دەکات لەو گوناهانەی ئەنجامیداوە.

**بەڵغەم:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵغەم ماڵێکی کۆکراوو گەشەسەندووە ، ئەگەر بینی بەڵغەمێ فڕێدەدات

دەرووی خێری لێدەکرێتەوەو ئەگەر نەخۆش بێت چارەسەری بۆ دەنێرێت.

*ئەگەر بینی فنگدەکات خێر دەکات بەنهێنی.

*ئەگەر خاوەن زانیارییبوو گیرو بێبەخشندە دەبێت.

*هەروەها دەڵێن: دەرهاتنی ئاو لەدەم ئامۆژگارییە لەزانایەکەوەو سوودی لێوەر دەگرێت ئەگەر بازرگانبوو لەقسەکانیدا راستگۆ دەبێت.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر جادوو، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿وَمِن شرِ النفاثاتِ فِي العُقد﴾(القلق: ٤).

**بەڵگەوبەهانە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەوەی لەخەودا ببینێ بەهانە لەسەر شتێك دەهێنێتەوە بەریەرەکانیی لەگەڵ مرۆڤێکدا دەکاتو بەهانە بەجێدەهێڵێت لەگەڵی بەپێی ئایەتی ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُم انْ كُنتُم صَادِقِين﴾.

**بەڵەك:** (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی لەخەودا ببینێ بەڵکبووە نهێنی ناخۆش دەبینێ.

**بەڵەك بەڵکبوون:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بوونی بەڵەکی لەرووخساردا بەڵگەی زۆری گوناهو تاوانە.

**بەڵەکی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵەکی بەدەستهێنانی جلوبەرگی ئاساییە.

*هەروەها دەڵێن: بەڵەکی ماڵو داراییە.

**بەڵێن (پەیمان):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی بەڵێنێکی باشیدا بەدەستیدەهێنێت.

*ئەگەر بینی بەڵێنێکی باشی پێدا خراپەیەکی لەدوژمنەکەیەوە پێدەگات یان لەکەسێکیترەوە.

*ئەگەر بینی دوژمنەکەی بەڵێنی خراپەی پێدا لەدوژمنەکەیەوە خێری پێدەگاتو ئامۆژگاری خراپەیە بەپێی چیرۆکی (ئادەم) ـ سەلامی خوای لێبێت ـ کاتێ قورئان سەبارەت بە(ئیبلیس) دەفەرموێ: ﴿هَلْ أدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَا يَبْلَى﴾(طه: ١٢٠). هەموو رەفتارێکی دوژمن واژوویەتی.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵێندان بەشتێك لەخەودا قەرزێکە بۆئەوەی بەڵێنی پێدراوە، ئەگەر بەڵێنەکەی بردەسەر بەڵگەیە لەسەر باوەڕو باشیو دڵنیایی.

**بەڵێندەر:** (نابلسی)دەڵێت: کەسێکە گوناه بۆ خۆی تۆمار دەکات.

**بەڵێندەرایەتی:** لەخەودا گوناهو تاوانە لەسەر یەکێك کۆدەبێتەوە ببینێ بوە بەبەڵێندەر.

*بەڵێندەرایەتی بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی‌و هەڵسوکەوت بەوەی خاوەنیەتی، ئەگەر بەڵێندەر نەخۆشبوو چاکدەبێتەوەو ئەگەر لەشساغبوو نەخۆشدەکەوێ.

**بەکرێدان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کرێگرتە پیاوێکە بەکرێدەر هەڵدەخەڵەتێنێ‌و هانیدەدا لەسەر کاروبارێکی پەشێو ناجێگیر، ئەگەر پێی هەڵخەڵەتا خۆی لێبەدوور دەگرێت‌و بەتەنیا بەجێی دەهێڵێت تیابچێت‌و رووبەڕووی چارەنووسی خۆی ببێتەوە.

(نابلسی) دەڵێت: گەر مرۆڤ لەخەودا شتێك بدات بەکرێ لەموڵك‌و شتومەکی تایبەتی بەڵگەیە لەسەر دڵنیابوونی لەترس‌و بیم ، بەکرێدانیش لەتەنگ‌و چەڵەمەو ناڕەحەتیەوە هاتووە، هەروەها دەگونجێت (بەکرێدان) بەڵگەبێت لەسەر (مارەبڕین).

**بەکرە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەکرە پیاوێکی بەسوودو کەڵکی باوەڕدارەو هەوڵدەدات بۆ خەڵکی لەکاروباری دنیاو ئایندا.

*ئەوەی ببینێ ئاوی پێدەردەهێنێت هەتا دەستنوێژی پێبگرێت پشتدەبەستێ بەپیاوێکی باوەڕدار کەئەویش پەنایگرتووە بەئاینی خودا چونکە پەت ئاینی خودایە، ئەگەر دەستنوێژی گرت‌و تەواویکرد سەرجەم غەم‌و پەژارە دەڕەوێتەوە.

*هەروەها دەڵێن: دۆڵچە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەدرێتە پاڵ داواکردن، ئەوەی دۆڵچەکەی بخاتە ناو بیرێکەوە تەماشای حاڵ‌و باری دەکرێت ئەگەر داواکاری هاوسەرداریبوو گرێبەستی هاوسەرداریی دەبەستێ‌و قەڵغان‌و پارێزەری هاوسەرگیری دەبێت‌و دۆڵچەکە عەورەتیەتی‌و ئاوەکەشی نوتفەکەیەتی‌و، بیرەکەش هاوسەرەکەیەتی.

*ئەگەر ئاوی هەڵگرتبوو خودا مناڵی پێدەبەخشێ ﴿فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُ قَالَ يَا بُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَامٌ﴾ (یوسف: ١٩) وەگەرنا سوودمەند دەبێت لەسەفەرو داوایا، چونکە کاروانەکە (یوسف)یان - سەلامی خوای لێبێت - دۆزییەوە کاتێ دۆڵچەکەی هەڵدایە ناوبیرەکەو دواتر کڕییان‌و فرۆشتیان‌و سوودیان لەفرۆشتنیکرد.

*ئەگەر دۆڵچەهەڵدەر خوازیاری زانیاریبوو بیرەکەی مامۆستاکەیەتی‌و ئەو ئاوەی کۆیکردۆتەوە ئەوا پشك‌و بەشیەتی.

**بەمەزنگرتنی مرۆڤ:** (نابلسی)دەڵێت: بەمەزن گرتنی مرۆڤ لەخەودا شکۆمەندییە ، خوداوەند دەفەرموێت: ﴿وتعزروه وتوقروه﴾(الفتح:٩)

**بەندکردن (زیندانی):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دیل‌وبەندکردن ملکەچی‌و غەم‌و پەژارەیە.

*هەروەها گوتراوە : زیندانیکردن بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی موڵك‌و دەستەڵات بەبەڵگەی چیرۆکی (یوسف) ـ سەلامی خوای لێبێت ـ بەندکردن لەماڵێکی گەچکاریکراوی نادیاردا بەڵگەیە لەسەر مردن‌و گۆڕ.

*ئەگەربینی لەماڵێکی داخراودا کۆت‌و بەندکراوە خێری دەستگیردەبێت، باری گرانیش خراپەکارو تاوانبارانن.

*ڕێ ونکردن سەرکردنە بەرێبازێکی پڕوپووچ دوای ڕێنموونی‌و خێرو سەرفرازی بەدەستهێنان.

*چوونە نێو زیندان هەرگیز باش نییە بەڵگەیە لەسەر درێژخایانی نەخۆشی‌و بەردەوام بوونی غەم‌و پەژارە گەر بەویستی خۆی یان بەزۆر بچێتە نێوی.

(نابلسی)دەڵێت: ئەوەی فەرمانڕەوایەکی ناسراوو بەناوبانگ ببینێ بەندو دەستگیردەکات غەم‌و پەژارەیەکی زۆر دێت بەسەریاو لەلێکدانەوەشدا وەك دیلکردن وایە.

**بەندیوان:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەگۆڕهەڵکەن لێکدەدرێتەوە.

**بەنگ فرۆش (حەشیش فرۆش):** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەروولێکردنەوەو قوتاربوون لەغەم‌و پەژارە.

**بەننا(خانووساز):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەننایەك بەخشت‌و قوڕ بینا بکات پیاوێکە هەڵدەسێت بەکۆکردنەوەی خەڵکی بەڕاست‌و دروستی.

*ئەوەی ببینێ بینا دەکات ژن دەهێنێت ئەگەر هاوسەرداربێت.

(نابلسی) دەڵێت: بەننا بەڵگەیە لەسەر شاعیرو تەمەن درێژییە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شەڕ لەدنیاداو حەزلێکردنی چونکە هەمیشە وەستاو بەننا دەڵێت: بێنە بێنە.

*بینینی بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی‌و تەبایی‌و پشتگیری.

**بەنەخوێن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەنەخوێن وەك شەرواڵ وایە.

*دەڵـێن: ماڵـە ، ئـەوەی بەنـەخوێنی شـەرواڵەکەی ببینـێ ژنەکـەی حـەرام دەبێت لەسەری یاخود دووکچی دەبێت ئەگەر ژنەکەی دووگیان بێت.

*ئەگەر بینی بەنەخوێنەکەی خستەژێر سەری قایل نابێت بەکورەکەی.

*ئەگـەر یـەکێك بەنەخوێنەکـەی پـچڕا بەخراپی مامەڵە دەکات لەگەڵ ژنەکـەی یـــان لـــەکاتی مارەکردنـــدا لێـــی دووردەکەوێتەوە.

*ئەگەر بینی بەنەخوێنەکەی بوە بەمار زاواکەی دوژمنیەتی.

*ئەگـەر بەنەخوێنەکـەی لـەخوێنبوو پیاوێك دەکوژێت بـەهۆی ژنێك یـاخود هاوکار دەبێت لەکوشتنی ژنێکی داوێـن پیسدا.

(نابلـسی)دەڵێـت: بەنـەخوێن ژنــەو بۆژنیش برایە یا زاوا یاخود مام.

*بۆ ژنی دووگیانیش کچە.

*بەنەخوێن ماڵی هاودەمو شەریکە.

*هـەروەها دەڵـێن: زاوای ژن یـان بـراو مـــامو گەورەیـــەتیو هێـــزو پـــەناو پشتگیریەتی.

*ئەگـەر بینـی بەنـەخوێنێکی خـوێنین مارەدەکات پیاوێك دەکوژێت یا مناڵێك یـاخود دەسـتی دەچـێت بـەخوێنی ئافرەتێکدا.

**بـەهار:** (نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا بەڵگەیە لەسەر:

+درهەمو پارە.

+کورێکی تەمەنکورت.

+ژنێك مارەبرینی زۆر ناخایانێت.

+دەستەلاتێك نامێنێتەوە.

+خۆشیەك بەخێرایی تێدەپەرێ.

**بەهەشت:** (ئەبو سەعد) دەڵێت: ئەوەی بەهەشـت ببینـێ بـەلام نەچـێتە نێـوی خەونەکـــەی مـــژدەی خێروچـــاکەیە سەبارەت بەباشیکردەوەی یاخود ئـەو رەفتـــاروکردارەی بـــەنیازە ئـــەنجامی بدات، هەروەها ئەو خەوەش دروستە.

*ئـــەوەی بەهەشـــت ببینـــێ بەحـــەزو ئاواتی خۆی دەگات.

*ئەگـەبینی دەیـەوێت بـچێتە نێـویو رێگـری لێکـرا گـەمارۆ دەدرێـت لـەوەی (حـەج)و جیهـاد ئـەنجام بـدات دوای ئەوەی دەیەوێت یاخود رێگری دەکرێت لەتەوبەو پەشیمانی لەوگوناهو تاوانـەی سوورە لەسەریو دەیەوێت تەوبە بکات لەسەری.

*ئەگـەربینی دەرگایـەك لـەدەرگاکانی بەهەشت داخرا یـەکێك لـەدایكو بـاوکی دەمرێـت ، ئەگـەر دوو دەرگـای بینـی داخـرا دایـكو بـاوکی دەمـرن، ئەگـەر هەموو دەرگاکانی بینـی داخـرانو هـیچ

دەرگایەك بەروویدا ئاوەڵانەکرا باوكو دایکی لێی تورەبوون.

*ئەگــەربینی وەك ئــەوەی دەیــەوێت بچێتە نێوی لەهەر ددرگایەکەوە دایكو باوکی لێی رازین.

*ئەگـەربینی خەریکـە دەچـێتە نێـوی خۆشـیو شـادی بەدەسـت دەهێنێـت لەگەڵ دڵنیایی لەدنیاو قیامەتدا بـەپێی ئایـــەتی: ﴿ادخلوهـــا بـــسلام آمنين﴾(الحجر:٤٦).

*ئەگـەربینی دەچـێتە نێـو بەهەشـت ئەجەلو مەرگی نزیکە.

*هەروەها دەڵێن: خەوبینەر ئامۆژگاری وەردەگرێـتو تەوبـەدەکات لـەگوناهو تـاوان لەسەردەسـتی ئـەوەی دەیباتـە نێو بەهەشت ئەگەر ناسی.

*هـــەروەها دەگوترێـــت: ئەگـــەربینی دەچێتە نێو بەهەشت بـەخوازو ویـستی خۆیــــدەگات دوای ناڕەحـــــەتیو دەردەسـەری چـونکە دەوری بەهەشت بەناڕەحەتی دراوە.

*هەروەها دەڵێن: خـاوەنی ئـەو خـەوە هاوەڵایـەتی کۆمـەڵێکی گـەورەو بـەڕێز دەکاتو بەباشی مامەڵە دەکات لەگـەڵ خەڵکیـداو فـەرزەکانی پـەروەردەگار بەجێدەهێنێت.

*ئەگـــەربینی وەك ئـــەوەی پێـــی دەگوترێـت بـچۆرە بەهەشـتو نەچـێتە نێـوی خەونەکـەی بەڵگەیـە لەسـەر وازهێنان لەئاین بـەپێی ئایـەتی: ﴿وَلاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾(الاعراف:٤٠).

*ئەگەر پێی وترا تۆ دەچیتە بەهەشت میراتی بۆ دەمێنێتەوە بـەپێی ئایـەتی: ﴿وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا﴾ (الزخرف:٧٢).

*ئەگەر خۆی لـە(فـیردەوس)دابینیـەوە رێنومایيو خەڵات بەدەستدەهێنێت.

*ئەگـــەر بەپێکەنینـــەوە چـــوە نێـــو بەهەشت زۆریادی خودا دەکاتەوە.

*ئەگەربینی شمشێری دەرهێناو ئەوجا چـوە نێـوی فەرمانبەچـاکە دەکـاتو رێگـری لەخراپـەو نیعمـەتو پاداشـتو باســـی بـــاشو پیاهەڵـــدان پێـــدا بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەربینی لەژێر درەختـی شـادمانیدا دانیـــشتوە خێـــری هـــەردوو دنیـــا بەدەســـتدەهێنێت بـــەپێی ئایـــەتی: ﴿طوبى وحُسن مئاب﴾(الرعد:٢٩).

*ئەگـــەربینی لـــەنێو باخـــەکانی بەهەشـتایە دڵـسۆزيو ئـاینی تـەواوو کامڵ بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەربینی لەبەروبومەکەی دەخوات بەئەندازەی خواردنی بۆئەو بەروبوومە زانیاری بەدەستدەهێنێت، هەروەها خواردنەوەی ئاووشیرو مەی بەهەشت بەدەستهێنانی دانایی و زانیاریی و دەوڵەمەندییە.

*ئەگەربینی لەسەر راخەرەکانی دانیشتوە بەڵگەیە لەسەر پاکیزەیی و پاکێتی هاوسەرەکەی و ساڵحی و باشی.

*ئەگەر نەیزانی کەیچوەتە نێوی نعمەت و شکۆمەندی بەردەوام دەبێت لەدنیادا بەدرێژایی تەمەنی.

*ئەگەربینی بێبەشکرا لەبەروبوومی بەهەشت بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی ئاینی بەپێی ئایەتی: ﴿مَنْ يُشْرِكْ بِاللهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ﴾ (المائدة:٧٢).

*ئەگەربینی بەروبوومی بەهەشت دەچنێتەوەو دەرخواردی کەسانیتریدەدا زانیارییەکەی کەسانیتر سوودی لێوەر دەرگرن و کاروکردەوەی پێدەکەن بەلام خۆی هیچ سوودێکی لێوەر ناگرێت.

*ئەگەربینی بەهەشت فرێدەداتە نێو ئاگری دۆزەخ باخێك دەفرۆشێت و نرخ و بەهاکەی دەخوات.

*ئەگەربینی ئاوی (کەوسەر)دەخوات پلەوپایەو سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت یاخود ژنێکی جوان و شۆخ و شەنگ دەکات بەهاوسەری خۆی بەپێی ئایەتی: ﴿حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ﴾(الرحمن: ٧٢).

*ئەگەربینی ژنانی بەهەشت مارە دەکات و منالە وردیلەکانی بەهەشت بەدەوریدا دێن و دەچن دەستەلات و نعمەت بەدەستدەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ﴾(الواقعة:١٧).

*هەروەها دەگێرنەوە: (حەجاج)ی کوری (یوسف) لەخەودا دەبینێت دوو حۆری بەهەشت لەئاسمان دێنەخوارەوەو (حەجاج) یەکێکیان دەباو ئەویتر دەگەرێتەوە بۆ ئاسمان ئەو خەوە دەگێرێتەوە بۆ (ئیبن سیرین)و ئەویش دەڵێ: دووفتنەیە یەکێکیان لەسەردەمی تۆدا دەبێت و دەیبینی و ئەویتر نابینی پاشان لێدانەوەی خەوەکە بەو چەشنەبوو (حەجاج) فیتنەی (ئیبن ئەشعەس)ی بینی و فیتنەی( ئیبن موهەلەب)ی نەبینی.

*ئەگەر رەزامەندی دەرگاوانەکانی بەهەشتی بەدیکرد شادی و خۆشی و

نیعمـــەتو ژنێکـــی خۆشـــنوود رووی تێـدەکات بەدرێـژایی ژیـانیو بـەدوور دەبێـت لەبـەڵاو نەهامـەتی بـەپێی ئایـەتی: ﴿وقَالَ لَهُم خَزَنَتُهَا سَلامٌ عَلَيكُم﴾(الزمر: ٧٣).

*ئەگەر فریشتەو پەری بینی دێن بۆ لای ســەلامی لێدەکـەن لەبەهەشـتدا لەسـەرکارێك بـەردەوام دەبێـتو پێـی دەگـات بەبەهەشت بـەپێی ئایـەتی: ﴿والمَلائِكَةُ يَدْخُلونَ عَلَيهِم مِنْ كُلِّ بَـابٍ﴾(الرعـد: ٢٣) وچارەنووســی بەخێر دوایی دێت.

(نابلسی)دەڵێـت: ئەگـەربینی دەچێتە بەهەشـــت شـــکۆمەندیو خۆشـــحاڵی بەندایەتی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەربینی مۆزی بەهەشت دەخـواتو لەژێر سێبەریدا دادەنیشێت بەویستو هیوای خۆیدەگات، ئەگەر لەشیرومەیو ئـاوی بەهەشـتی خـواردەوە دانـاییو زانیاریونازو نیعمەت بەدەستدەهێنێت.

*ئەگـە لـەئاوی (کەوسـەر)بخواتـەوە زانیـاریو کـرداری باشـەو دڵنیـاییو شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبـەر(ﷺ) بەدەسـتدەهێنێت، ئەگـەر بێبـاوەڕبوو باوەڕ دەهێنێت ئەگەر سەرپێچیکاربوو تەوبەدەکات یان لەبیدعەوە دەچێت بۆ سـوننەت یـا لـەژنێکی خراپـەوە بـۆ ژنێکی بـاش یـاخود لەکاروکاسبیەکی حەرامەوە بۆ پیشەو کارێکی حەڵاڵ.

*چوونە نێو بەهەشـت بەڵگەیـە لەسـەر خۆشـی مامەڵـە لەگـەڵ پـەروەردگارداو پاداشتی باش.

*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر نارەحەتیو ناسۆری.

*ئەوەی بچێتە نێو بەهەشتو نـەخۆش بێت لەنەخۆشی پارێزراو دەبێت.

*دەگونجێـت چـوونە نێـو بەهەشـت بەڵگەبێت لەسەر:

+ماڵودارایی حەڵاڵو دروست.

+چاکەکردن لەگەڵ خانەوادەیا.

+گوێڕایەڵیو پارێزگاری پەروەردگار.

+فریشتەی بەهەشت.

*دەگونجێت چـوونە نێـوی بەڵگـەبێت لەسەر فەروبەرەکەتی زۆر یـاخود رزقو رۆزی.

*دەگونجێـت چـوونە نێـو بەهەشـت بەڵگـەبێت لەسـەر رەواندنـەوەی غـەمو پەژارە، ئەگەر سەرجەم خەڵکی چوونە نێـــو بەهەشـــت بەڵگەیـــە لەســـەر خۆشـــحاڵیو دادپـــەروەریو موڵـــكو دەستەڵات.

*ئەگەر چوە نێوی بەشمشێرەکەیەوەو جلوبـــەرگی جـــەنگی لەبـــەردابوو بەڵگەیەلەسەر مردنی بەشەهیدی.

*ئەگــە چــوە نێــوی‌و کتێبەکــەی بەدەســتەوەبوو زانیــاری‌و کــردەوەی یەکانگیردەبێ.

*دەگونجێــت بــچێتە نێــوی بــەهۆی زەکاتدان.

*ئەگــەر چــوە نێــوی‌و ژنەکــەی لەگەڵدابوو بەڵگەیــە لەســەر مامەڵــەی باشی لەگەڵ هاوسەرەکەی.

*ئەگــەر بــەدەم ویــردو زیکــرەوە چــوەنێوی دەگونجێــت بەنوێــژو یــــادوزیکری خــــوا بەهەشـــت بەدەستبهێنێت.

*ئەگەر لـەدەرگای رۆژوانانـەوە چـوە نێــو بەهەشــت دەگونجێــت بــەرۆژو بەهەشتی بەدەستهێنابێت.

*بینینی بەهەشت بەڵگەیە لەسەر:

+مزگەوتو جیهاد.

+فەرمانبەچاکەو رێگری لەخراپە.

+زانیاری‌و کردەوەی چاکە.

+قەڵغانێك بپۆشی‌ و بیپارێزێ.

*ئەگــەر لــەروبارەکانی بەهەشــت ئـاویخواردەوە یـاخود لەبــەروبوومی خــواردو لەژێرســێبەری درەختــەکانیا دانیــشتو حــۆری‌و منداڵــە وردیلــە جوانــەکانی دی زانیــاری‌و رێنمــایی‌و رزق‌و رۆزی‌و موڵــك‌و بەرچــاو رۆشــنی‌و تەمــەنی درێــژ بەدەســتدەهێنێت‌و دەگونجێت بەشەهیدی بمرێت، روباری ئــاویش بەڵگەیــە لەســەر پــاکێتی، رووبــاری مــەیش بەڵگەیــە لەســەر خامۆشی‌و شەیدابوون بـەیادو زیکـری خــــوداو خەشـــــــموقینگرتن لەحەرامکراوەکان ، روباری هەنگوینیش بەڵگەیە لەسەر زانیاری‌و قورئان.

*خــواردنی بــەروبوومی بەهەشــت دەرەنجامی کاروکرداری چاکەیە لەگەڵ هاوسـەرو منـداڵ، درەختـی شـادیی بۆ یەکێك لەژێرسێبەرەکەیدا دانیشتبێت‌و پــاڵی پێوەبــدات بەڵگەیــە لەســەر دەرەنجامی چاك‌و باش.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لێبڕان‌و یەکلاییبوونــــەوە بــــۆ خواناســــی‌و سوودوەرگرتن لەپلەوپایەداران.

*داری (ســدرة المنتهــی) لەخــەودا دەکەوێتـە نزیـك عەرشـی پـەروەردگارو بەڵگەیــە لەســەر گەیــشتن بەهــەموو پەیمان‌و بەڵێنێك.

*دەگونجێـت درەختــەکانی بەهەشــت بەڵگــەبێت لەســەر زانایــانی رەفتــا شیرین‌و جوان کەوا رێنمویدەرن.

*حــۆری‌و منداڵــەو وردیلــەکان ئەگــەر هاوەڵایــەتیان بکــەن کــورو ژنــان لەدەستدەدەن‌و لەبەهەشتدا قەرەبووی بۆ دەکرێتەوە.

*بینینی حۆری و منداڵی وردیلە بۆ خەڵکی تایبەت لەبێداریدا دامانە لەبەردەم کۆسپ و رێگرەکاندا یاخود رامان لەئاتای خۆشیەکانی دنیادا وەك ماڵ و خۆشی بژێوی و جۆرەکانی تری خۆشی.

*چوونە نێو کۆشکەکانی بەهەشت بەڵگەیەلەسەر:

+بەدەستهێنانی پلەوپایە بەرزەکان.

+پۆشینی جلوبەرگی گرانبەهاو هاوسەرگیری لەگەڵ ژنانی ئازادو سەربەخۆ.

+دەوڵەمەندی و چارەنووسی باشی.

*بینینی رەزامەندی بەڵگەیەلەسەر:

+بەرپرسی بەهەشت.

+فریشتەی مژدەبەرو خێروچاکە.

+بەجێهێنانی بەڵێن و پەیمان.

+بەجێهێنانی پێداویستی و دوعاگیران.

*ئەوەی بینێ دەچێتە نێو بەهەشت و لەبەروبوومەکەی ناخوات و ئاویشی ناخواتەوە سوود وەرناگرێ لەو زانیارییەی بەدەستیهێناوە.

*ئەگەربینی لەبەهەشت دەردەکرێ هاوچەشنی کاری (ئادەم) (سەلامی خوای لێبێت)ئەنجامداوە.

*ئەگەربینی لەبەهەشتدا تەوافدەکات بەڵگەیە لەسەر زۆری رزق و رۆزی و پلەوپایەی بەرزوبڵندو دڵنیابوون لەترس وبیم.

*ئەگەربینی بترسێ و ببینێت دەچێتە نێو بەهەشت دڵنیادەبێت ، ئەگەر غەم و پەژارەداربێت دەرووی لێدەکرێتەوە ، خۆئەگەر رەبەنبێت هاوسەردەگرێت.

**بەهێ**: زوربەی راڤەکارانی خەو بەباشی نازانن و گوتویانە نەخۆشییە بەهۆی رەنگی زەردیەوە.

*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر سەفەر.

*هەندێکی دی دەڵێن: سەفەرێکە دێتە رێی لەگەڵ سەرکەوتن و گونجاندا.

*هەندێکی دی دەڵێن: سەفەرێکە هیچ خێرێکی تێدانییە.

*داربەهێ پیاوێکی ئاقڵ و ژیرە سوودی نییە بەهۆی زەوییەکەیەوە.

*هەندێکی دی دەڵێن: بەهێ لەخەودا باشە بۆیەکێك لەهەر حاڵ و بارێکدا بەدیبکات، چونکە ناوەکەی بەفارسی بەمانای (خێروچاکە) هاتوە، ئەگەر بازرگانێك بینی بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانج، ئەگەر بەرپرس و فەرمانرەوایەك بینی بەڵگەیە لەسەر فراوانی دەستەلاتەکەی.

*ئەگەر بینی بەهێ دەگوشێ لەپێناوی بازرگانیدا سەفەر دەکاتو سوودو قازانجێکی زۆری دەستگیر دەبێت.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی بەهێ دەخواتو نەخۆشبوو چاکدەبێتەوە، ئەگەر فەرمانڕەوابوو دەستەلات بەدەستدەهێنێت ، ئەگەر خاوەنی لەشساغو تەندروستی باشبوو و خواردی ڕێنموونی دەکرێت، ئەگەر بازرگانبوو سوودو قازانجدەکات.
*داربەهێ پیاوێکی بەتواناو ئیشوکار یەکلاکەرەوەیە بەلام بەهۆی زەوییەوە سوودی لێوەر ناگیرێ.
*هەروەها دەڵێن: بەهێ خراپە لەخەودا .
*بەهێی سەوز باشترە لەهی زەرد، بەهێ بەڵگەیە لەسەر سەفەرێکی باشو گونجاو.
*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر سەفەر.
*هەندێکدەڵێن: سەفەرێکە کەواهیچ خێرێکی تێدا نییە.
**بەیانی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەجیهێنانی بەڵێنە، ئەوەی لەخەودا گزنگی بەیان ببینێو لەحاڵێکی خراپدابێت بەڵگەیە لەسەر بێباوەڕی یان سەرپێچی ، ئەگەر خەوبینەر کارێك لەشوێنو جێگەیەك ئەنجامبداتو بەیانی لێهەڵبێت مژدەی دەستەلاتو پلەداری پێدەدرێ.
*بینینی ڕۆژبوونەوە بۆ کشتوکاڵ زیانە.
*ئەگەر بینی بەیانی داهات ئەگەر نەخۆشبوو نەخۆشییەکەی دەڕەوێتەوە بەچاکبوونەوە یان مردن.
*ئەگەر بەرنوێژیکرد بۆ خەڵکی چاوەڕێی سەفەردەبێت یان دەچێ بۆ (حەج) یا بەهەشت بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر ئاوی هەڵگۆزت یان خواردنی کۆکردەوە یا جۆی کڕی نەخۆشیو بەلا رووی تێدەکات.
*ئەگەر زیندانیەك بەیانی بەدیکرد ئازاد دەکرێ.
*ئەگەر یەکێك بینی ژنەکەی دەرچوو لەبڕیاری لێی جیادەبێتەوە لەبەرئەوە دووهاوسەرو خۆشەویست لەیەك جیادەکاتەوە.
*ئەگەر گوناهبارێك ئەوەی بینی یان کەسێکی نەزانو بێئاگا یا بێباوەڕێکی هەوەسباز تەوبەدەکات لەبێئاگاییو سەرگەردانی بێدار دەبێتەوە.
*ئەگەر کەسێکی بێبەش یان بازرگانێك بینی بازرگانیەکەی ساردی بەسەرا هاتو بازاڕی نەبوو دیسان بازاڕی گەرم دەبێتو دەکەوێتەگەڕ.

*ئەگەر کەسێك بینیو دوژمنەکەی بێباوەڕو ستەمکاربوو زاڵدەبێت بەسەریا لەحەق بەدەردەکەوێ.

*ئەگەر خەڵکی ئاسایی بینی بەنەبوونیو ناڕەحەتیو ستەمو فیتنەو ژیانیان دەبردەسەر لەسەرجەم ئەو بارە قوتاردەبنو رزگاریان دەبێت.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ئەگەر بینی هەڵهات رێنومایيو رووناکییە.

*ئەگەر بینی رۆژهەلات شادیو خۆشی بەدووی یەکدا دێت چونکە بەیانی رووناکییە دوای تاریکایی دێت.

*ئەگەر بینی شتێکی لێونبوو لەشەوێکی تاریکداو دۆزییەوە لەبەرەبەیاندا نەیارێکی هەیە رقو قینی لێدەبێتەوەو دووان شاهیدی بۆ دەدەنو پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿وقرآن الفجر ان قرآن الفجر كان مشهودا﴾ (الإسراء: ٧٨).

**بەیداخ(ئالا)**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی ئالای پێدراو کەوتەدەستی دەستەلات بەدەستدەهێنیو بەردەوام لای دەستەلاتداران پلەوپایەی باشدەبێ.

*ئەگەر بینی ئالاکەیان لێسەند لەپۆستی دەستەلاتو فەرمانڕەوایی دەخرێ.

(قەیرەوانی)دەڵێت: ئالاو بەیداخ بەڵگەیە لەسەر پادشاو دادوەرو زاناو چەتر.

*ئەگەر ئالایەکی لەدەستدا بینی بەڵگەیە لەسەر دەستەلات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شکۆمەندیو دڵنیایی لەوەی لێی دەترسیو خۆی لێدەپارێزێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گوێڕایەڵیو ئەمەکداری بۆ ئیسلامو لەدایکبوونی کوڕ یان هاوسەرگیری ژنو پیاو.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا بەیداخو ئالایەکی هەڵداو شایستەبوو خێر دەبینێ، وەگەرنا هیچ خۆشیەك نابینێ.

*ئەگەر بەیداخێکی بەدەستەوەبینی مارەبڕینە ئەنجامیدەدات.

*ئەگەر بەیداخو ئالایەکی بینیو دژایەتیو دژومنایەتی هەبوو پێی هەڵناسێ..

*ئەگەر رمێکی بەدەستیەوە بینی ئالایەکی پێوەبوو بەخێرایی دەمرێ یان کوڕەکەی دەمرێ.ئەگەر ئالاکەی لەماڵێکدا بینی لەو ماڵەدا پیاوێك دەمرێ.

*ئەگەر ئالآیەکی بەدەستەوەگرت ژنێکەو ئەگەر ئالاکە سوربوو ژنێکی خراپە ، ئەگەر سپیبوو ژنێکی باشە لەماڵێکی چاك ، خۆئەگەر رەشبوو ژنێکی شووم‌و ناقۆلآیە ، ئەگەر رەنگاو رەنگبوو ژنێکی خراپەکارە.

**ب ی**

**بیابان:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر دوارۆژو قیامەت چونکە لەوێوە مرۆڤ دەگات بەمەنزڵەکانی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لانەو شوێنی بەندایەتی‌و دەستبەرداربوونی دنیاو گریان بەدەم ئامۆژگاری‌و مۆچیارییەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لانەی بێباوەڕان‌و بیدعەکاران چونکە مردوو لەلێکدانەوەدا تێکچوونی ئاینە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوانەی گاڵتەو سووکایەتی دەکەن بەو رەفتارانەی مرۆڤ تیادەبەن وەك شوێنی زیناو داوێنپیسی‌و مەیخواردنەوە سەرخۆش‌و مەستی تێدایەو هیچ کارێك ئەنجام نادەن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیندان، چونکە مردوو لەگۆڕەکەیدا بەندکراوە، ئەوەی بچێتە نێویەوە بەبێداری نەخۆش بێت دەچێتە نێوگۆڕو دەمرێت بەو نەخۆشیە بەتایبەت ئەگەر ماڵ‌و لانەیەکی تێدابوو، ئەگەر نەخۆش نەبووو کاتێ چوە نێوی بەملکەچی‌و چاوی پڕ لەئەشکەوە چوو یان قورئانی دەخوێندو لەنوێژدابوو رووبەقیبلە روودەکاتە خێرۆمەندان‌و کۆڕی یادو زیکرو سوود وەردەگرێت لەوەی دەیبیستی‌و گوێبیستیبوە.

*ئەگەر کاتێ چوویەرەو بیابان بزەوخەندە لەسەرلێوەکانیبوو یاخود عەورەتی دیاربوو یان لەگەڵ مردواندا دەڕۆیشت بەرێوە روو لەخەڵکی شەرەنگێزدەکات لەگەڵ بێ ئاینان‌و تێکەڵ بەکارەکانیاندەبێت.

*ئەگەر بەبانگدانەوە چوەنێوی ئامۆژگاری یەکێکدەکات سوودی لێوەرناگرێت‌و فەرمان بەچاکە دەکات بەڵام کەس بەگوێی ناکات‌و حەق‌و دادپەروەری‌و گەواهیدان لەنێو گەل‌و نەتەوەیەکی نەزان‌و بێباوەڕدا پیادە دەکات ، بەڵام ئەوەی مردوو ببینێ لەگۆڕەکانیان هاتوونەتە دەرەوە یان گەڕاونەتەوە بۆ ماڵەکانیان بەنەناسراوی لەزیندان ئازاد دەکرێت یان ئەو بەروبوومەی خەڵکی ناشتویانە لەئافەو بەلاّ قوتاردەبێت دوای ئەوەی ناهومێددەبن لێی بەهۆی

قات‌وقرپییه‌وه‌، ئه‌مه‌ش به‌بێ زیادوکه‌می خه‌وه‌که‌و حاڵی بێداری خه‌وبینه‌رو ئه‌و به‌ڵگانه‌ی دیارو به‌رچاون.

*ئه‌وه‌ی گۆڕهه‌ڵبداته‌وه‌ داوایه‌کی په‌نهان‌و دێرین ده‌خاته‌ روو، چونکه‌ عه‌ره‌ب به‌په‌نهان‌و نادیار ناوی ده‌بات له‌خێر یان شه‌ڕدا ، ئه‌گه‌ر گۆڕی زانایه‌کی شاره‌زای هه‌ڵدایه‌وه‌ تاوتوێی مه‌زهه‌ب‌و رێچکه‌ی ئه‌و ده‌کات‌و زانیاری ئه‌و زیندوو ده‌کاته‌وه‌، هه‌روه‌ها هه‌ڵدانه‌وه‌ی گۆڕی پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ئه‌گه‌ر خه‌وبینه‌ر گه‌یی به‌پارچه‌ په‌ڕۆی له‌ت‌و په‌ت یان ئێسکی پروکاو له‌زانیاریی به‌ده‌رده‌چێت‌و به‌بیدعه‌و کاری ناڕه‌وا دوایی دێت.

*ئه‌گه‌ر له‌گۆڕه‌که‌یدا به‌زیندوێتی بینی‌و گه‌یی به‌ویستی سوننه‌ت زیندوده‌کاته‌وه‌و ئاینه‌که‌ی به‌و ئه‌ندازه‌یه‌ پیاده‌ ده‌کات، هه‌روه‌ها هه‌ڵدانه‌وه‌ی گۆڕی کافرو بێباوه‌ڕ یان بیدعه‌چی یاخود یه‌کێك له‌ناموسوڵمانان دوای مه‌زهه‌ب‌و رێگه‌ی وێڵ‌و سه‌رگه‌ردانه‌کان ده‌که‌وێت‌و پاساو بۆ ماڵ‌وداراییی حه‌رام ده‌هێنێته‌وه‌ به‌فێڵ‌و ته‌ڵه‌که‌.

*ئه‌گه‌ر دوای هه‌ڵدانه‌وه‌ی گۆڕ گه‌یی به‌له‌ش‌ولارو که‌لاکێکی بۆگه‌ن یاخود گه‌یی به‌قوڕولیته‌ی ره‌ش یا پیساییه‌کی زۆر له‌به‌ڵگه‌هێنانه‌وه‌دا به‌هێزتره‌و ده‌گات به‌بێئابڕوویی‌و فه‌سادی خوازراو، هه‌روه‌ها ئه‌وه‌ی مردوویه‌کی بینی زیندوبوه‌ته‌وه‌ رێبازو ژیانی له‌خێریان شه‌ڕدا زیندوو ده‌کرێته‌وه‌ به‌تایبه‌ت ئه‌گه‌ر خه‌وبینه‌ر له‌خانه‌واده‌ی ئه‌وبوو یاخود له‌ماڵه‌که‌ی ئه‌ودا بینیان گه‌رده‌سته‌لاتداره‌که‌یان زانابوو.

*به‌لام خواردنی مردوو له‌ماڵێکدا نه‌خۆشی تێدابێت به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر مردن‌و تیاچوونی، وه‌گه‌رنا ماڵ‌و دارایی ده‌گات به‌خانه‌واده‌که‌ی.

*ئه‌وه‌ی مردوو بانگیده‌کات ئه‌گه‌ر نه‌خۆشبێت ده‌گات پێی ، گه‌رله‌شساغیش بێت ئامۆژگاری ده‌کات هه‌تا پاشگه‌زببێته‌وه‌ له‌وکاره‌ی ده‌یکات.

*ئه‌وه‌ی مردوو لێی بدات یاخود به‌رووخسارێکی گرژه‌وه‌ رووبه‌رووی بێته‌وه‌و هه‌ڕه‌شه‌ی لێبکات‌و واز له‌سلاوبهێنێت باوریابێت‌و ئه‌و وه‌سیه‌تنامه‌یه‌ی مردوه‌که‌ی کردوویه‌تی بباته‌سه‌ر له‌نێوان خۆی‌و خوای گه‌وره‌دا ، ئه‌گه‌ر به‌روویه‌کی گه‌ش‌و سوپاس‌و سلاوو ماچکردنه‌وه‌

رووبەرووی بوەوە مژدەی باشەی پێدەدات و باسی مردووش لەشوێنی خۆیدا بەدوورو درێژهێنراوە.

* هەڵگرتن لەسەر دارەمەیت دووپاتی مەرگ دەکاتەوە، دەگونجێت دەستەلاتێك بەدەست بهێنێت تێدا گەردن و ئەستۆی خەڵکی ملکەچ بکات، ئەسپەردەو بەخاك سپاردنیش دەقاو دەق بەڵگەیە لەسەر مەرگ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+زۆرمانەوە لەسەفەردا.

+هاوسەرگیری کورو کچو لەبەرکردنی جلی زاراو بلاوکردنەوەی بۆن و بەرامی خۆش و سەردانکردنی لەهەفتەی یەکەمدا.

+زیندان بۆئەوەی پەی پێدەبات.

* ئەگەر فراوانبوو وەك زاویەك نوست بەڵگەیە لەسەر خێروچاکەو باشەو رۆژو دەرەنجامی باش و دنیای بەرین و فراوان دەبێت، ئەگەر پێچەوانەی حاڵ وباری خراپدەبێت و ژیانی ناخۆشدەبێت.

(ئیبن سیرین)هەمیشە وتویەتی: پێمخۆشە لەمردوو شت وەربگرم بەلام رقم لێیە شتێکی پێبدەم.

* هەروەها دەڵێت: ئەگەر مردوو شتێکی لێبردی ئەوشتە نامێنێت.

* ئەگەر وایبینی ماڵەکەی کراوە بەگۆڕێك بۆخۆی ماڵ و لانەیەك لەوشارو گەڕەکەدا دروستدەکات و تێدا ئەسپەردە دەکرێت.

* ئەوەی لەگۆڕێکدا ئەسپەردە بکرێت و زیندووبێت زیندانی دەکرێت و فشاری دەخرێتەسەر.

* ئەگەر بینی باوەشدەکات بەمردوویەکداو تێکەڵدەبێت لەگەڵی درێژی تەمەنی خەوبینەرە.

* ئەگەر مردووەکەی بەنووستوویی بینی پشوودانی مردوەکەیە.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی گلکۆ لەخەودا هێمنی و ئارامییە بۆ کەسی ترسنۆك و بۆ ئەوەی ئارامیگرتووە ترس وبیمە.

* دەگونجێت گلکۆی بەڵگەبێت لەسەر ترس وبیم و ئومێدو گەڕانەوە بۆ رێنمویی دوای وێڵی و سەرگەردانی.

* بینینی گلکۆ هاوەڵپەیداکاران غەم و پەژارەو ترس وبیم و گومانە لەئایندا، بینینی بەڵگەیە لەسەر شوێنی بیدعەو زیندانی ناخۆش، ئەگەر بەبانگدانەوە رووی تێکرد ئامۆژگاری کەسانێکدەکات پەندوەرناگرن و فەرمان بەچاکەی بێ ئەنجامەو گەواهی راستی لەنێو کۆمەڵێکی نەزان و بێباوەڕدا بێکەڵك و سوودە.

*گۆڕستانی بەناوبانگوناسراویش فەرمانێکی حەق وراستییە ، ئەگەر بینی دەچێتە نێوی و قسەو گوفتاری باش دەدرکێنێ روو لەراستییەکدەکات و تێدا دەچەسپێ، خۆئەگەر بەجێی نەهێناو نەچوە نێوی لەو رووداوە بێئاگادەبێت.

(ئیبن سیرین)دەڵێت: بردنەوەیە یاخود دەرچوونە لەناڕەحەتی رووبەخۆشی، یان لەگوناهەوە بۆ تەوبەو لەدۆڕانەوە بۆ سوودو قازانج و لەنەخۆشیەوە بۆ تەندروستی و لەش ساغی.

*ئەگەر خۆی لەوێدا بینی فراوانی و رێزو خۆشی و شادی بەدەستدەهێنێت بەئەندازەی وشکانی و بوونی سەوزی تێدا.

*بیابان هەژارییەو دۆڵ و شیوی بێ کشتوکاڵ (حەج)ە بەپێی ئایەتی: ﴿رَبَنَا انِي اسْكَنْتُ مِنْ ذُرِيَتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ﴾(ابراهیم: ٣٧).

*ئەگەربینی لەدۆڵێکدایە وتەیەك دەڵێ بەجێی ناهێنێ بەپێی ئایەتی:﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِ وَادٍ يَهِيمُونَ ، وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَالاَ يَفْعَلُونَ﴾ (الشعراء: ٢٢٥_٢٢٦).

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر خۆی لەبیابانێکدا یان شوێنێکی وێرانە بینیەوەو هەژارکەوتبوو دەمرێ.

*رۆیشتن بەبیاباندا خۆکردنە بەکارێکدا هیچ سوودو قازانجێکی نییە.

**بیابانی فرە ناڕەحەتی و دەردەسەری:**

(نابلسی)دەڵێت: غەم وپەژارەیەو بەڵگەیەلەسەر رەواندنەوەی چارەنووس و قەدەرو هاتنی خۆشی وشادی و دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نیازی منداڵ وداێك.

**بیبەر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بیبەر ماڵ و سامانێکە ماڵ و دارایی پێدەپارێزێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی بیبەر دەخوات ژار یان شتێکی تاڵی پێدەبەخشرێ ، هەروەها وتراوە: ماڵ و سامانێکی بەرێزی دەستگیردەبێ.

*بیبەرێکی زۆر ماڵێکە نەخورابێت، ئەگەر شتێکی لێخوارد غەم و پەژارەیە چونکە گەروو دەچوزێنێتەوەو وشکە تێیدا.

**بیدستر**[1]: (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر درێژخایاندنی دەردو نەخۆشی ، ئەوەی نەخۆش بێت بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەو شیفای ، بەتایبەت ئەگەر لەئاوەکەی خواردەوە ئەندامەکانی گەرمدەکات و رەحمی

---

[1] **بیدسترا:** گونی ئاژەڵێکە لەدەریادا دەژیو بچووکترە لەسەگ مووقژدارە. (وەرگێر)

ســارد دەكاتــەوەو لــەرزینی ســووك‌و چارەسەردەكات.

**بیر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەگونجێت بەڵگەبێت لەسـەر خاوەنەكـەی چونكە ئەو بەرپرسیەتی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسـەر چونكە ئاوی لێهەڵدەگوزێت لـەرەحمیا هەڵدەگیرێ.

* ئەگەر لێكدانەوەی بـەپیاو بێـت ئـاوی بیرەكـە مـاڵ‌و داراییەكەیـەتی لەگـەڵ بـژێوی كەبۆخانـەوادەی خەرجدەكات، هـەركات خێـری زیـاد بكـات خێـری لەماڵەوە زیاد دەكات هەتا لێیدەڕژێ.

* ئەگـەر بیرەكـە ئـاوی لەبـەر ڕۆیـی نهێنی‌و قسەیەتی‌و، هەركات ئاوەكەشی كـــەمبكات بـــژێوی‌و ڕزق‌و ڕۆزی لاواز دەبێت.

* ئەگـــەر قوڵبـــوو بەڵگەیـــە لەســـەر ڕەزیلـی‌و ڕژدیـی، نزیكـی ئاوەكەشـی بەئەندازەیەك دەستپێی بگـات بەڵگەیە لەســـەر دڵفراوانـــی‌و بەخـــشندەیی‌و ماڵ‌وداراییی.

* ئەگەر بیرەكە ژن بێت ئاوەكەی مـاڵ‌و كۆرپەكەیـەتی‌و هـەركات دەستی پێـی بگات نزیكە منالّی ببێت، خۆئەگەر لێـی ڕژا بەسـەر زەویـدا منـاڵی دەبێـت یـان لەباریدەچێت.

* دەگونجێـت بـیر بەڵگـەبێت لەسـەر خزمـەتكارو ئوتومبیـل‌وقتازەمـاڵ‌و كەسـێكی خێرۆمەنـدی مـاڵ كـەوا ئـاودەدات بـەخێر یـان هۆكـاری خێـر دەگرێتەبەر یاخود لەسەفەردا یارمـەتی خەڵكیدەدات.

* دەگونجێـت بـیری نادیـار بەڵگـەبێت لەسـەر سـەفەر چـونكە كـاتێ دۆڵـچە دەخرێتـە نـاوی تێیـدا دێـت‌و دەچـێت وەك موسافیر وایە.

* دەگونجێـت بـیری نادیـار خێربێـت لەرێگەوبانەكانـداو بەڵگـەبێت لەسـەر بازاڕەكان كەڕوویان تێدەكات.

* دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر دەریـا یان حەمام یاخود مزگەوت كەلەشگرانی لێدەردەچـــێت یـــان پیـــسی‌و بێدەستنوێژی لێدەردەكرێت.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+ئەو زانایەی زانیـاری لێوەردەگیرێـت‌و غەم‌و پەژارە دەڕەوێنێتەوە.

+ئـافرەتی داوێنپـیس ڕێگـری ناكـات لەهیچ كەسێك.

+زینـدان‌و گـۆڕ وەك چـۆن تووشـی حـەزرەتی (یوسـف)(سـەلامی خـوای لێبێت) هات.

* ئـەوەی ببینـێ دەكەوێتـە نـاوبیرێكی نادیارەوە ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێـت ،

ئەگەر لەنێو کەشتیەکدابوو دەشکیێو نوقم دەبێت لەنێو ئاودا.

*ئەگەر بێباوەڕ بێت و سەفەربکات ناپاکیو غەدر دەکات.

*ئەگەر ناکۆکیکاربێت زیندانی دەکرێت وەگەرنا بەزۆر دەچێت بۆ حەمام یان ماڵێك کەشوێنی داوێنپیسییە.

*ئەگەر ژنێك لەبیرێکی نادیار ئاوی دەرهێناو دووگیانبوو خوداوەند کوڕی پێدەبەخشیێ بەپێی ئایەتی: ﴿فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُ قَالَ يَا بُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَامٌ﴾ (یوسف).

*ئەگەر کاڵاو کەلو پەلی هەبوو لەدەریادا یان لەوشکانیدا دەگات پێی.

*ئەگەر نەخۆشی هەبوو لێی قوتار دەبێت.

*ئەگەر زیندانی هەبوو رزگارو ئازاد دەکرێت.

*ئەگەر موسافیرو ئاوارەبوو دەگەڕێتەوە.

*ئەگەر رەبەنبوو ژن دەهێنێت.

*دەگونجێت هانا بۆ فەرمانڕەوا ببات لەبەجێهێنانی پێداویستیو بۆی بەجێبێت، سەرجەم ئەمەش ئەگەر دۆڵچەکەی بەسەلامەتیو پڕی هاتەدەرەوە.

*ئەگەر بینی سوود لەو ئاوە وەردەگرێت لەماڵو داراییەکەی خەرجدەکات.

*هەندێك دەڵێن: ئەگەر بیرێکی بینی ژنێکی رووخۆشو دەم بەخەندەیە.

*ئەگەر ژن بینی پیاوی رەوشتبەرزە.

*ئەوەی ببینیێ بیرێك هەڵدەکەنیێو ئاوی تێدێت ژنێکە ماڵو دارایی نییە، ئەگەر لەئاوەکەی خواردەوە ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت بەفرۆفێڵ ئەگەر خۆی هەڵیبکەنێت.

*ئەگەر بیرێکی کۆنو دێرین ببینیێ لەگەڕەکەکەی یان ماڵەکەی یا گوندەکەیو خەڵکی ئاوی لێدەربهێنن بەدۆڵچەو پەت ژنێك یان مێردی ژنێكو چاودێری سوودی لێوەردەگرێت لەبژێوییان لەو حاڵەداو ئەوشوێنە باشە بەهۆی پلەوناستی ئەو پەتەی کەئاوەکەی پێدەردەهێنریێ بەپێی ئایەتی:﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا﴾(ال عمران: ١٠٣).

*ئەگەر بینی ئاو لەوبیرە دەڕوات خەمو پەژارەو گریان لەو شوێنە دەردەچێت.

*ئەگەر پڕبوو لەئاو بەڵام لێی نەڕژا هیچ راڤەیەکی خراپ هەڵناکرێت.

*ئەگەر وای بینی بیر هەڵدەکەنیٚو ئاوی لێدەردەهێنریٚ بۆ ئاودانی باخەکەی چارەسەرێك وەردەگرێت بۆ خانەوادەکەی.

*ئەگەر وای بینی بیرەکەی ئاوی لەبەر رۆیی زیاد لەوەی لەبەری رۆیوەو ئاوەکەی چوە ماڵەکانەوە ماڵێك بەدەستدەهێنێتو دەبێت بەمایەی ئاشوبو فیتنە بۆیو، ئەگەر کونو دەروازەی بۆ ئاوەکە دروستکرد هەتا دەربچێت لەخەمو پەژارە قوتار دەبێتو ماڵەکەی بەئەندازەی ئاوەکە بەفیڕۆ دەچێت کەدەرچووە.

*ئەوەی ببینیٚ کەوتوەتە ناوبیرێکەوەو ئاوەکەی لێڵە هەڵسوکەوت لەگەڵ فەرمانڕەوایەکی ستەمکار دەکاتو تاقیدەکرێتەوە بەستەمو زۆرداریی.

*ئەگەر ئاوەکە پاكو روونو بێگەردبوو هەڵسوکەوت دەکات بۆ پیاوێکی ساڵحو پێی رازی دەبێت.

*ئەگەر بینی دەکەوێتە نێو بیرێك یان دەنێرێتە ناوبیرێك سەفەر دەکات.

*ئەگەر بیرەکەی بینی لەشوێنێکی نادیارو ئاوی تێدابوو ئاوەکەشی روونو سازگارو بێگەردبوو منداڵێکی نەفسو دەروون چاكو تەمەندرێژی پێدەبەخشریٚ، ئەگەر بیرەکە ئاوی تیا نەبوو تەمەنی بەسەر دەچێت.

*رووخانی بیر مردنی ژنە ، ئەگەر بینی هەردوو قاچی شۆڕبوەتەوە بۆ ناوبیرەکە فرِوفێڵدەکات بەماڵەکەی یان تورِە دەبێت .

*ئەگەر دابەزییە نێو بیرێكو گەیشتە نیوەیو بانگی تیادا سەفەر دەکات ، ئەگەر رێگەکەی بڕی پلەوپایەو دەستەلاَت یان سوودو قازانج لەبازرگانی بەدەستدەهێنێت یان مژدەی پێدەدرێت.

*ئەگەر گوێبیستی بانگبوو لەنیوەی بیرەکەدا لەکار لادەبرێت ئەگەر فەرمانڕەوابوو ، ئەگەر بازرگانبوو زەرەر دەکات.

*هەندێك دەڵێن: ئەوەی بیرێك ببینیٚ لەماڵەکەی خۆی یان زەویو زارەکەیدا رزقو رۆزیو بژێوی فراوان بەدەست دەهێنێتو شادی لەدوای ناخۆشی رووی تێدەکات.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی بێتەسەر بیرێکی داپۆشراو ماڵێکی کۆکراوەی دێتە دەست.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بیرێك ئاوی تێدابوو لەماڵێکدا ژنێکی دەوڵەمەندی غەمبارە.

*ئەگەر بیرەئاوەکە ئاویان لێهەڵگۆزی پیاوێکی بەسوودەو خێردەکات لەپێناوی خوادا.

*ئەگەر بیرەکە سەرکەی تێدابوو پیاوێکی خوانەناسی ناپێنداره، خۆئەگەر کەفی تێدابوو خاوەن ماڵوداراییەکی تەواوە، ئەگەر داودەرمانی چێشتی تێدابوو پیاوێکی نەخۆشە.

*پیاوێك هات بۆ لای(ئیبن سیرین)و وتی: لەخەودا بینیم گۆزەی ماڵەکەم شکا (ئیبن سیرین)یش وتی: ئەگەر خەوەکەت وابێت ژنەکەت تەلاقدەدەیت.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر غەموپەژارەو زیندانی، ئەوەی غەمو پەژارەدار بێت غەمو پەژارەکەی دەڕەوێتەوەو پەیوەندی دەکات بەگەورە پیاوانەوەو پلەوپایە بەدەستدەهێنێت. ئەگەر خەوبینەر زانستپەروەربوو خەڵکی سوود لەزانیارییەکەی وەردەگرن بەتایبەت زانستی خەو لێکدانەوە.

*دەگونجێت نوێنەری گەورە پیاوان رووی تێبکەن و شادو دڵخۆشبێت.

*دەگونجێت ناخۆشی بکەوێتە نێوان خەوبینەرو ناحەزانی و ناپاکی و غەدری لێبکەن، بەلام دواتر سەردەکەوێت بەسەریاندا، یان لەوانەیە خەوبینەر تاوانباربکرێت بەتوهمەیەك و پاك و بێگەردیش بێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەروولێکردنەوەو کۆتایی هاتنی غەموپەژارەو بەدەستهێنانی پێداویستی.

*هەروەها بەڵگەیەلەسەر:

+سەفەر.

+خەتەنەوبڕین.

**بیرکردنی نیشتمان:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر جیابوونەوەی دووهاوسەر یان هاوڕێ یاخود دەوڵەمەندبوون دوای هەژاری.

**بیرە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خواردنی بیرە لەلایەن خزمەتکار یان پیاوێکی توندو تیژەوە ڕەواندنەوەی غەمو پەژارەیە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا رزق و رۆزییە بەمانەوەتێ لەپیاوێکی رژدەوە دەردەچێت یان گەیشتنە بەپیاوێکی خۆشەویست یادەرخستنی خۆشییە.

*بیرەو هەموو پارەیەکی زەرد بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی بۆیەکێك بیخواتەوە.

**بیرەفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر شەرابفرۆش، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی منداڵان خوێیانی پێدەپارێزننەوە لەخوێندنگە یان فرۆشگا.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر دەرخستنی نهێنیی و غەم و پەژارە بۆ یەکێك داوایدەکات یاخود پاراستنی بۆ خوازیارێك.

**بیری سەردا پۆشراوو پڕکراوە:** بەڵگەیە لەسەر شوێنی شاراوەو پەنهان یان گەنجینە، یاخود لەسەر کیسە بەڵگەیە لەسەر ماڵ و دارایی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قەرز، ئەگەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە.

*ئەوەشی میزی تیابکات و میزەکەی شیربێت یان هەنگوین روو لەحەرام دەکات ئەگەر نادیار بێت، ئەگەر لەماڵی خۆیدا بێت ئەو کارە لەگەڵ خانەوادەی خۆیدا ئەنجامدەدات.

(نابلسی) دەڵێت: ئاو لەخەودا ژنێکی رووخۆشی بزەو خەنداوییە، ئەگەر ژنێك بیبینێ پیاوێکی بەڕەوشت و بەرزە.

*بیر ماڵ یان زانیاریی یاخود هاوسەرگیری ئەنجامدانە یا پیاوێکی گەورەیە یان زیندان و کۆت و بەندو فرۆفێڵە.

*ئەگەر وای بینی کەوتە نێو بیرێکەوە پلەوپایە بەرزی دادەبەزێ.

*دەگونجێت بیر بەڵگەبێت لەسەر:

+باوك و دایك.

+رەوشت.

+فرۆفێڵ.

+هۆکار.

+بەجێهێنانی پێداویستی.

+سەفەرو داواکاریی و رەزیلی و بەخشندەیی.

*هەربیرێك لێکدانەوەیەکی هەیە، بیری نێو ماڵ بەڵگەیە لەسەر خاوەن ماڵ یان فرۆشگاکەی یا هاوسەرو خزمەتکارەکەی یان مردن و ژیانی.

*__بیری بێئاو__: پەککەوتنی سەفەرە لەگەڵ جموجووڵ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنی داوێنپیسی بەدڕەوشت.

*__بیری گەڕەك و گوزەر__: بەڵگەیە لەسەر پاسەوانەکەی یان ئەوەی کاروباری دراوسێ بەڕێوەدەبات.

*__بیری سەرەڕێ__: بەڵگەیە لەسەر دەرولێکردنەوە دوای ناڕەحەتی و دەردەسەری.

*__بیری ئاودێری__: بەڵگەیە لەسەر دنیا کەوا کۆمەڵی خەڵکی تیا خۆشحاڵ و کۆمەڵێکیتر هەژار دەبن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانیاری و قوتابخانەو قوتابی.

*ئەو بیرەی ئاوی تیا نەبێت بەڵگەیە لەسەر فرۆفێڵ و قەرز لەسەفەردا.

*ئەگەر بیری زەمزەمی بینی لەیەکێك لەگەڕەکەکاندا یان لەشارێکی ناسراودا پیاوێکی بەسوود ڕوودەکاتە ئەو شوێنەو خەڵکی سوود لەدوعاو چاکەی وەردەگرن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەرکەوتنی خەڵکی ئەوشارە بەسەر دوژمنەکانیانداو بەدەستهێنانی فەڕو بەرەکەت.

*دەگونجێت بارانێکی بەسوود ببارێت بەسەریاندا لەکاتی پێویستیاندا.

*ئەگەر ببینێ لەسەر لێواری بیرێك وەستاوەو ئاوی لێدەردەهێنێت ئاوەکەش ڕوونو پاکە ئەگەر لەزانستخوازانبوو بەئەندازەی دەرهێنانی ئاو زانست بەدەست دەهێنێت، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت ، ئەگەر ڕەبەنبوو ژندەهێنێت، ئەگەر ژنەکەی دووگیانبوو کوڕێکی دەبێت بەتایبەت ئەگەر بەدۆڵچە ئاوی دەرهێنا، وەگەرنا هۆکارێك دێتە ڕێی ناچاریدەکات ملکەچ بەخەڵکی ببێت، ئەگەر خوازیارو داواکاری پێویستیەکبوو بۆی بەجێدێ، ئەگەر دەیویست سەفەربکات لەسەفەرەکەیدا سوودو قازانج بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر داواکاری خراپەبوو بۆی بەدێت، ئەگەر ئومێدێکی هەبوو بەدەستی دەهێنێت.

*ئەگەر ئاوی بیرەکە نزیکبوو پیاوێکی بەخشندەو دڵفراوان دەبێت، ئەگەر دووربوو پیاوێکی ڕژدو بەرچاو تەنگە.

*ئەگەر ئاوی بیرەکە ڕۆچوو زەوی قووتیدا بەڵگەیە لەسەر بێباوەڕیو هاوەڵپەیداکردن بۆ پەروەردگار.

*دەگونجێت بیر بەڵگەبێت لەسەر دوو دڵی لەئایندا یا پێچەوانەکەی.

*ئەوەی ببینێ لەبیرێکەوە تەماشا دەکات بیردەکاتەوە لەژنێكو بەوەش خێرێکی گەورەی دەستگیر دەبێت.

*ئەوەی ببینێ بیرەکەی دێتەوەیەكو ژنەکەی نەخۆشبوو چاکدەبێتەوە.

*ئەوەی ببینێ ئاوی بیر دەخواتەوە ڕووداوێکی بۆ دێتەپێش.

**بیمارستان( نەخۆشخانە )**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر حەمام چونکە شوێنی جنۆکەو شەیتانەکانەو دەرخستنی عەورەتو خۆدەرخستنە لەسیفەتی خراپدا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قوتابخانە کەخوێندنی تێدا ئەنجامدەدەرێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شوێنی ئارەزوو ورێنەو قسەی بەرزو نزمو ماڵ دزین و جیابوونەوە لەمنداڵ.

*ئەگەر مردوویەك لەنەخۆشخانە بینرا ئاگرە چونکە نەخۆشخانە شوێنی زنجیرو کۆت و بەندە.

*ئەگەر خۆی لەنەخۆشخانە دییەوە لەگەڵ بیمارو نەخۆشدا دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیندان.

*ئەگەر لەگەڵ شێتەکاندابوو بەڵگەیە لەسەر زیندانیبوون لەگەڵ تاوانباران، ئەگەر لەشساغبوو نەخۆشدەکەوێ، ئەگەر نەخۆشبوو دەگونجێت نەخۆشیەکەی درێژەبخایەنبێت یاخود بەغەریبیی و شەهیدی بمرێ، دەگونجێت بۆ هەژار بەڵگەبێت لەسەر دەوڵەمەندی بەوەی کەبەدەستی دەهێنێت لەخێرو خۆشحاڵی و یارمەتی.

**بینا(ساختمان)**:(نابلسی) دەڵێت: بینینی بینا لەخەودا لەسەر زەوی سوود وەرگرتنە لەدنیا بەئەندازەی بینینی.

*دەگونجێت لێکدانەوەی بینا هاوسەرداری پیاو لەگەڵ ژندابێت، ئەگەر بینای شتێکیکرد بەڵگەیە لەسەر کاروباری لەگەڵ ژندا.

*ئەگەر بینی ماڵەکەی فراوانبوو بەئەندازەیەکی باش فراوانییە لەکاروباری دنیادا، ئەگەر لەئەندازەی خۆی دەرچوو کۆمەڵ و کەسانێك بەبێ رەزامەندی خۆی دەچنە ماڵەکەیەوە لەکاتی نەهامەتی وەك پرسە یان شایایی و ئاهەنگدا.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی ببینێ بینا دەکات خزمەکانیەتی لەگەڵ هاوەڵ و کەسە نزیکەکانی، ئەگەر دەستەلاتداربوو گەڕانەوەی بارو حاڵی پێشوویەتی و خۆشی و شادییەو پتر بەهێزو پتەو دەبێت و کاروبارو حاڵی بەئەندازەی بیناو ساختمانەکە بڵند دەبێتەوە، ئەگەر بیناکەی لەبن دەرهێنا پەرتەوازەیی و جیاوازی کەوتنە نێوان کەسەکانیەتی و لەکیسچوونی دەستەلات و توانایەتی.

*ئەگەر بینی بینایەکی نوێ و تازە دەکاتەوە بۆ زانایەك نوێکردنەوەی باس و خواسی ئەو زانایەیە، ئەگەر بیناکە هی (فرعەون)بوو یان ستەمکارێك باس و خواسی دەهێنێتە پێش و لێی دەدوێت.

*ئەگەر بینی دەستیکردەوە بەبینایەك و چاڵی هەڵکەندوەو لەبناغەوە دروستیدەکات لەداواکردنی

زانیـاری یـاخود دەسـتەلآتدا خـوازو ئاواتی خۆی بەدەستدەهێنێت.

*ئەوەی ببینێ لەشارێك یان گوندێك بینایەك دروستدەكات لەو شارە ژنێك دەهێنێت ئەگەر لەشووشە دروستیكرد جوانكاریو رووپامایيە، ئەگـەر لـەگلّو قـوڕ دروسـتیكرد كاروكاسـبی حـەلاڵو دروستە ، ئەگەر هەڵكەنرابوو زانیـاریو دەستەلآتە لەگەڵ پاكیو خۆشحاڵی.

*ئەگەر بینـی بینایـەك لەگـەچو خـشت دروسـتدەكاتو وێنـەو تـابلۆی تێدایـە سەردەكات بـەكاری نادروسـتدا چـونكە بیناكردن بەگەچو خشت دووڕوویيە.

*هـەروەها دەڵـێن: ئـەوەی گەچـكاری پیشەی بێت یان كاری گەچكاری بكـات كاری نادروستدەكات.

*ئەوەی ببینێ لەولآتو شاری بێگانەدا بینا دەكات هاوسەرگیری دەكات لەگەڵ ژنێكـدا كەپێـشتر بـاس نـەكراوە یـان لــەولآتی بێگانــە نیـشتەجێ دەبێــتو لەوێش دەمرێت.

*بینــاكردن بــەقوڕ بریتیــە لــەئاینو دڵنیایی، قـوڕیو وشـكیش دەركـەوتنی ماڵو داراییە.

*ئــەوەی ببینــێ قوڕكــاری گــۆڕی پێغەمبـەر دەكـات بـەماڵو سـامانێك (حەج)دەكات.

*ئــەوەی ببینــێ قوڕكــاری ماڵەكــەی دەكاتو قوڕەكە شلە ساڵحو باشە.

*ئــەوەی ببینــێ قوڕەكــە دەخــوات ماڵەكـــەی دەخورێـــت بەئەنـــدازەی خواردنی بۆ قوڕەكە.

*بیناكردن بەشێوەیەكی جوان بەڵگەیە لەســـەر تـــەبایيو خۆشەویـــستيو هاوەلآیـــەتيو رزقو رۆزی بـــاشو هاوسەری كچو منداڵ خستنەوە لێیان.

*دەگونجێت بینا بەڵگەبێت لەسەر:

+پشتگیریو هاوكاری.

+لەسـەرئەوەی دروسـتیدەكات، ئەگـەر بیناكـە كەنیـسەو دێریكبـوو بەڵگەیـە لەســـەر ئـــەوەی بیناكارەكـــەی مەسیحییە، ئەگەر مزگـەوتبوو بەڵگەیـە لەســـەر ئـــەوەی بیناكارەكـــەی موســـوڵمانە، ئەگـــەر قوتابخانـــەو حوجرەبوو بیناكاری مامۆستاو زانایە.

*بینینی بینا لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هیمەتو توانای خاوەنەكەی.

*ئــەوەی لەخــەودا مزگــەوتێك یــان شوێنێك دروستبكات لـەپێناوی خودایا ئەگـــەر پادشـــابوو دادپـــەوەری جێبەجێـدەكاتو فـەرمان بەچـاكەو رێگری لەخراپە دەكات، ئەگـەر زانـابوو كتێبێـك دەنووسـێت خـەڵكی سـوودی لێـوەر دەگـرن ، ئەگـەر مـاڵو دارایـی

داربوو زەکات دەدات، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەرگیری ئەنجام دەدات، ئەگەر هاوسەرداربوو خودا کوڕێکی پێدەبەخشێ‌و کوڕەکە ناویانگ دەردەکات‌و پیاوچاك دەبێت، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت ، وەگەرنا خزمەتی ئەو شوێنە دەکات‌و بەیادو زیکری خوا ئاوەدانی دەکاتەوەو کاروبارەکانی دەبات بەڕێوە ، وەگەرنا تەبایی‌و چاکسازی لەنێوان خەڵکیدا دەکات‌و یارمەتیان دەدات لەسەر گوێڕایەڵی پەروەردگار، یاخود دەبێت بەدەلاڵ‌و دواتر تەوبەو پەشیمانی دەردەبڕێت‌و دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا لەوەی ئەنجامیداوەو پاشان رێنموونی دەکرێت‌و بەشەهیدی دەمرێت یاخود ئەو بینایە دەبێت بەکۆشکی ئەو لەبەهەشتدا.

*ئەگەر بەشتێك بینایکرد کەبینای پێنەدەکرا یان لەئاڕاستەی دوانگەکە لایدا یاخود بۆلایەکیتر گۆڕی بەڵگەیە لەسەر شەڕ.

*ئەوەی ببینێ گومەزێك دروستدەکات لەسەر هەور دەستەلات‌و فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت.

*ئەوەی ببینێ لەسەرو ئاسمان‌و زەوییەوە بینایەکی هەیەو گومەزی سەوزە کارەکانی باش‌و چاکدەبن‌و بەشەهیدی دەمرێت.

*ئەوەی ببینێ گەرماوو حەمامێك دروستدەکات ژنێك دەکات بەهاوسەری خۆی.

*ئەگەر نەخۆشێکی بینی وەك ئەوەی ماڵ خانوویەك دروستبکات‌و نەزانێت کێ رووخاندوویەتی لەش‌و لارە یان تەندروستی بۆ دەگەڕێتەوەو نەخۆشی لەکۆڵدەبێتەوە.

*ئەوەی ببینێ باوکی بینایەك دروستدەکات‌و ئەویش رێك‌و بەرزی دەکاتەوە کاروکردەوەکانی باوکی تەواو دەکات کەلەئاین‌و دنیادا کردوویەتی‌و پتەوی بەهێزدەکات.

*ئەوەی ببینێ کرێکاران ئیش‌وکار دەکەن لەماڵێکدا لەگەڵ ژنەکەیدا شەڕدەکات یان واز لەهاوەڵێکی دەهێنێت‌و هاوچەشنی ئەوەیە.

**بیناڕووخێنەر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەوەی بینادەڕوخێنێ هەڵدەستێت بەشکانی بەڵێن‌و پەیمان.

## ب ێ

**بێباوەڕ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی بەدەر لەپەروەردگار دەپەرستی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خۆی سەرقاڵکردوە بەکاری پووچ‌و

بەتاڵـەوەو حـەزو ئـارەزووی خـۆی زاڵكـــردوە بەســـەر رەزامەنـــدی پـەروەردگاردا، ئەگـەر ئـەو پەیكـەرو بتـەی دەیپەرست لـەزێڕبوو لـەپیاوێك نزیكدەبێتـەوە ، خوداوەنـد خەشـمو قینی لێیەتیو بەهۆی ئـەو هەوڵەشـەوە خراپـەو زیـانی پێـدەگات، هـەروەها خەوەكەی بەڵگەیە لەسەر لەكیسچوونی ماڵو دارایيو سستیو خاوی رووكردنـە ئاینەكەی.

* ئەگەر ئەو بتە لەزیوبوو هۆكارێكی بۆ پێـشدێت بگـات بـەژن یـا كـچێك لەسەربارێكی ناپاكو قێزەون.

* ئەگەر ئەو پەیكەرو بتە لـەزێڕبوو یان لەئاسـن یـا قوڕوشـم دەسـتبەرداری ئاینـــدەبێ لـــەپێناوی دنیـــاو خۆشیەكانیداو خوداوەند لەبیر دەكات.

* ئەگـــەر پەیكـــەرو بتەكـــە لـــەدارو تەختەبوو رقی لەئاینەكـەی دەبێتـەوەو پـــشتگوێیدەخاتو هاوەڵایـــەتی بەرپرســـێكی ســـتەمكاردەكات یـــان پیـــاوێكی دووڕوو خـــۆی بەدینـــدار دەنوێنێ لەپێناوی دنیاو بەگەڕخستندا.

* هەنـدێك لەراڤـەكاران دەڵێن: بینینـی پەیكەرو بت بەڵگەیە لەسەر سەفەرێكی دوور.

* هـەروەها دەڵـێن: ئەگـەر پەیكـەرو بتێكی بینی بـەڵام پەرستنی نـەبینی مـــاڵو ســـامانێكی بێـــشوماری دەستدەكەویَ.

* ئەگـەر بینـی ئەسـتێرە یـا دارێـك دەپەرستیَ كەسێكە ئاینی (صابئە)ی هەیە ئەو گەلو نەتەوەیەش لەوانەنو خوداوەنـد لەبارەیانـەوە دەفـەرموێ: ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ﴾(النساء:١٤٣).

* هەروەها دەڵێن: ئەو خەونە بەڵگەیە لەســـەر ئـــەوەی خاوەنەكـــەی بەخزمەتگوزارییـەك لـەپیاوێكی رێـزدار نزیكدەبێتەوەو سووكایەتی بەئاینەكەی دەكات.

* ئەگـــەر بینـــی ئـــاگر دەپەرســـتیَ سەرپێـچی خـودا دەكـات بەگوێڕایـەڵی شەیتان یان داوای شەڕو جەنگدەكات.

* ئەگـــەر ئاگرەكـــە بڵێـــسەدارنەبوو داواخـوازی حـەرام دەبـێ بەئاینەكـەی چونكە حەرام وەك ئاگرە.

* ئەگـــەر بینـــی بـــوە بـــەبێباوەڕ بۆچـــوونەكانی هاوتـــای بۆچـــوونی بێباوەڕانە.

* ئەگەر بینی بـوە بەئاگرپەرست وازی لەئیـــسلام هێنـــاوەو خـــستویەتیە پشتگوێ بەئەنجامدانی گوناهو تاوان.

*ئەگــەر بینــی بــوە بەجوولەکــە واز لەفەرزەکان دەهێنــیٚ و سزاو تۆڵەکــەی بــەر لــەمردنی پێــدەگاتو ملکەچــیو سووکیو نزمــی دێت بەسەریا چونکە جوولەکــە بــەڕاوی ماســی لەشــەممەدا سەرپێــچییانکردو فــەرمانی خودایــان شــکاندو کارێکیــان ئەنجامــدا ڕێگــری لێکرابوو خوداشکردنی بەمەیمون.

*ئەگەر بینی بەجوولەکەبانگکرا بــەڵام وازی لـــەو ناوەهێنـــا لەتـــەنگو چـــەڵەمەدابوو چـــاوەڕێی دەرووی خێریدەکرد خوداوەند بەسۆزو بــەزەیی خــۆی ڕەحمــی پێــدەکات بــەپێی ئایەتی: ﴿ انَّا هُدْنَا الیكَ قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ اشَاءُ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ (الأعراف: ١٥٦).

*ئەگەر بینی بوە بەمەسیحی بێبــاوەڕ دەبێــت بــەنازو نیعمەتــەکانی خــوداو خوداوەنــد بــەجۆرێك باســیدەکات کەلێیدوورە.

*ئەگــەر بینــی لــەوڵاتی ئیــسلامەوە روویکــردە وڵاتــی بێبــاوەڕان بێبــاوەڕ دەبێت دوای باوەڕهێنانی.

*ئەگــەر بینــی دەســتی گــۆڕاوە بــۆ دەستی (کیسرا) چــی لــەژێر دەستی (کیــسرا)دا روویــداوە هــەمان رووداو لەژێردەســـتی ئەویـــشدا روودەداتو دەرەنجامی باشنابێت.

*ئەگەر بینی دەستی وەك یەکەمجای لێهاتوەتـــەوە تەوبـــە دەکـــاتو دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگارەکەی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دوژمنە ، ئەگــەر پیرێکــی بێبــاوەڕی بــەدیکرد دوژمنێکــی کۆنەقینــدارەو خەشمـوقینی لەناخدا حەشاردراوە.

*ئەگەر کچێکی بێبــاوەڕی بینــی شــەڕو خراپەی بەنهێنی پێدەگات.

*ئەگــەر بینــی خــۆی بێبــاوەڕبوە هەنگوینی لەبەردەم دانراوە بــەڵام لێــی ناخوات بێباوەڕە بەنیعمەتەکانی خودا، زۆری بێباوەڕان زۆری منداڵە.

*ئەگــەر بینــی بێبــاوەڕبوەو تەوبــەی نــەکردوە لەبێباوەڕیەکــەی دەکــوژرێ مەگــەر جوتیــاربێ تــۆو بــچێنیٚ و زەوی دابپۆشیٚ.

**بێبـــاوەڕیی:** (ئــیبن ســیرین) دەڵێــت: بێبـــاوەڕیی لەلێکدانـــەوەدا بەڵگەیـــە لەســەر دەوڵەمەنــدی بــەپێی ئایــەتی: ﴿كَلاَّ انَّ الإنْسَانَ لَيَطْغَى (٦) أنْ رَآهُ اسْتَغْنَى (٧)﴾ (العلق: ٦- ٧).

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ستەمو زۆرداری بەپێی ئایــەتی: ﴿ والكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾ (البقرة: ٢٥٤).

*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر نەخۆشییەك چارەسەری نــەبێت بــەپێی

ئایەتی: ﴿سَوَاءٌ عَلَيهِم أَأَنْذَرْتَهُم أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُم لاَيُؤْمِنُونَ﴾ (البقرة: ٦) زۆری بێباوەڕان زۆری منداڵە.

(نابلسی) دەڵێت: بێباوەڕی ستەمو زۆردارییە.

* ئەگەر بینی وێڵ‌و سەرگەدانبوو هەڵەدەکات هەروەك چۆن ئەگەر بینی هەڵەیکرد سەرگەرداندەبێ.

* ئەگەر بینی ئاینەکەی تێکچوو لەلای خەڵکی‌و بەدیار چاویانەوە گەواهی پووچ‌و بەتاڵدەدات، هەروەها دەڵێن: بێباوەڕی نکوولیکردنی حەقەو خوداوەند دەفەرموێ: ﴿قُتِلَ الإِنْسَانُ مَا أَكْفَرَهُ﴾ (عبس: ١٧).

* بێباوەڕی نکوولی نازو نیعمەتە یان خاوەن نازو نیعمەتە، دەگونجێت بێباوەڕی بەڵگەبێت لەسەر دەرەنجامی نەخۆش‌و نزیکبوونەوەی لەلێواری مەرگ.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر فتنە لەئایندا‌و کوشتنی مرۆڤێکبێت.

**بێپارە( موفلیس )**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا مرۆڤێکە پارەی دەستدەکەوێ ئەگەر لەخەونەکەدا بەڵگەی خێری تێدابوو، ئەگەر بەڵگەی خراپەی تێدابوو بێپارە دەبێت.

* ئەگەر لەخەودا بەبێپارە بانگکراو گەواهیدەرێکی لەگەڵدابوو بەڵگەیە لەسەر سوودو، ئەگەر گەواهیدەری شەڕی لەگەڵبوو بەڵگەیە لەسەر بێپارەیی یاخود کەسێکی زمان پیسی خراپ دەبێت چونکە فلس کەمترین پارەیە.

**بێپارەیی**: (نابلسی)دەڵێت: بێپارەیی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کەم‌و کوڕی حاڵی کەسی بێپارە لەئاین‌و دنیادا.

* ئەگەر کەسی بێپارە بینی نەخۆشە بەڵگەیە لەسەر مردن‌و نەمانی رزقی، یا لەپیشەکەی خۆیەوە دەچێت روو بەپیشەیەکیتر کەوا لەخوار پیشەکەی خۆیەوە دەبێت یان لەوڵاتێکەوە دەچێت بۆ وڵاتێکیتر.

**بێداری ( ئاگاداریی )**: (نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر کاردروستی‌و ئەنجامدانی‌و گەڕانەوە لەوکارەی خەشم‌و قین هەڵدەگرێ.

* ئەگەر بینی خەوتوویەکی بەئاگاهێنا رێنوماییدەکات بۆ رێبازی راست.

**بێزراو**: (نابلسی)دەڵێت : لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جیاکەرەوەی حەق‌و ناحەق بەفەرمان‌و رێگرتن.

**بێژنگ( سەرەد )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەبێژنگدان بەڵگەیە لەسەر:

+خواناسی لەکارو کاسبیدا.
+نەمانی درهەمو دینار.
+قسەو وتەی باش لەنێو خراپو ناقۆڵادا.
*قەفەزی مریشك بەڵگەیە لەسەر لانە ، ئەگەر بینی قەفەزێك مریشكی تێكرد ماڵو خانوویەك دەكڕێو لەگەڵ ژنێكدا دەچێتە نێوی، ئەگەر قەفەزەكەی لەسەر سەری داناو بەبازاڕدا پیاوەیگەڕا ماڵەكەی دەفرۆشێو گەواهیو شایەتی دەدەن لەسەری.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:
+زانیاری.
+جیاكردنەوە.
+شكۆمەندیو پلەوپایە.
+جیاكردنەوەی حەق لەراستی.
*هەروەها بێژنگ بەڵگەیە لەسەر شانە چونكە شانە پیسی لەقژدەكاتەوە.
*ئەگەر یەكێك بەڵێنیداو بێژنگی بەدەستەوەبوو بەڵێنەكەی ناباتەسەر.

**بێستانو كێڵگەی خەیار:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجو رزقو رۆزی كەبەدووی یەكدا دێت.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنێك خاوەن نەوەو وەچەبێت.

*ئەگەر بوو بەخاوەنی بێستانو كێڵگەی خەیار ، ئەگەر شایستەی فەرمانڕوایبوو پێیدەدرێتو زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەكانیدا، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت ، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ، ئەگەر خوازیاری زانیاریبوو چەندین هونەر لەخۆی دەگرێ، ئەگەر سەرپێچیكاربوو تەوبەدەكاتو دەگەڕێتەوە بۆلای خواو بەرهەمی تەوبەكەی وەردەگرێ.
*ئەگەر بەروبوومی ئەو كێڵگەیەی بینی بەسەری دارەوە بەڵگەیە لەسەر بیدعە لەئایینداو ستەمو رژدیو گرانی یان هەڵگرتنی باج لەسەریو كەموكوڕی بەروبوومی دارو درەخت.
*ئەگەر ئەو كێڵگەیە لەزێڕو زیوبوو بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانج لەوەی تێدایە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بازاڕسارڵی یاخود روودانی كەموكوڕی تێدا چونكە گوێزراوەتەوە بۆ حاڵێك ناخۆشی.

**بێشكە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بێشكە خێرو فەڕو كرداری باشەیە.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی بێشكەیەكی كڕی یاخود خۆی لەنێو بێشكەیەكدا دییەوە خێرو فەڕ لەسەر

دەسـتی بەجێـدێت بـەپێی ئایـەتی:
﴿وَمَـنْ عَمِـلَ صَـالِحًا فَلِأَنفُـسِهِمْ يَمْهَدُونَ﴾ (الروم:٤٤).
*هەروەها دەڵێن: پشووە ، یان کـوڕی ژنێکی بەسۆزو بەزەییـە یـان منـداڵێکی بچووکە.
*بێشکە بـۆ پیـاوان غـەمو پـەژارەی زیندانە یاخود لانەیەکی تەنگە بۆیەکێك تێدا بنوێت ، بۆ رەبەن هاوسەرو بۆ ژن کوڕە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسـەر شـوێنی گۆرانیو سەماو ئارەزوو.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسـەر ئـاژاوەو پێکـدادان یـان بەڵگـەبێت لەسـەر دارەمەیت.
**بێڵ**: (ئیبن سـیرین)دەڵێـت: خزمـەتکار سـوودو قازانجـە چـونکە خـاكو خـۆڵو زبـڵ رادەمـاڵێ هـەموو ئەوانـەش مـاڵو داراییەو کەس پێویـستی نابێـت مەگـەر یـەکێك ئـەوەی هـەبێت بـۆ رەبـەن هاوسەرگیرییە، بۆیەکێکیش رزقو رۆزی گیرابـێ دەرووڵێکردنەوەیـە ، بۆیـەکێك بـــژێوی هـــەبێت بەڵگەیـــە لەســـەر بەدەستهێنانی.
*هـەروەها کـارکردن بـەبێڵ یا رامـاڵین پێـی بەڵگەیـە لەسـەر پـارەوەرگرتنو کوشتارگە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانین.
*هـــەروەها بەڵگەیەلەســـەر زانـــین، هـەروەها دەڵـێن: کـوڕە ئەگـەر ئـیش بەبێڵەکـە نـەکات ئەگـەر ئیشی پێکرد خزمەتکارە.
(نابلـسی)دەڵێـت: بێـڵ خاوەنەکـەی دنیایـەکی باشـی دەسـتگیر دەبـێو دەبێت بـەپیاوێکی بـەهێزی متمانـەدارو هەمیـشەماندو هـەموو کەسـێك پـەنای پێدەگرێو دەگات بەدوایین ئەنجام.
*هـــەروەها بەڵگەیـــە لەســـەر ژنێکـــی بەئارام لەسەر ماندبوون وهیلاکی.
*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر رزقو رۆزیو سوودو قازانجو چوستو چالاکی لەبەرانبەر نەخۆشیدا.

# پی



پ ا

**پاچ( پیمەرە ):** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سەختیو هەنگاونان روو بەکارە چاکەکان.

*هەروەها پاچ پیاوێکە ماڵو سامان بەلای خۆیدا بەکێشدەکات.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: پاچ کۆیلە یان خزمەتکارە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شمشێر لەبۆ بێباوەڕان ئەگەر لەدار درستکرابوو.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرئەوەی سوودی لێوەردەگرێ چونکە لەئاسن دروستکراوە.

*هەندێکدەڵێن: کورەو هەندێکیتر دەڵێن: ئەسپەردەیە لەگەڵ هێزی ئاین بەپێی ئایەتی: ﴿فَجَعَلَهُم جُذَاذاً الاَّ كَبِيراً لَهُم﴾ (الأنبياء: ٨٥) (ئیبراهیم - سەلامی خوای لێبێت - بەپاچ لەتو پەتیکردن.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پشتگیریو رزقو رۆزی، دەگونجێت ئەگەر نەخۆشی سەرئێشەی لەگەڵدابێت چاك بێتەوە یان پێویستی بەکەڵەشاخ بێت لەپاشیدا.

*دەگونجێت پاچ بۆنەخۆشێك کەپێویستی بەخواردن نەبێت بەڵگەبێت لەسەر لابردنی سکاڵاو نارەزایی.

*پاچ منداڵێکی نێرینەیە.

*ئەگەر پاچێکی بەدەستی خۆیەوە بینی ئەوە دەبێت بە جێگر یان ئەسپەردە دەپارێزیو چاکە لەئاینەکەیدادەکاتو زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا، هەروەها دەڵێن: پاچ بەڵگەی زیانو پەرتەوازەییە.

**پاراستن لەشەڕو جەنگ:** پاراستن لەشەڕو جەنگ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پاراستن لەترسو بیم.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رێنومایی دوای وێڵیو سەرگەردانی بەتایبەت ئەگەر مرۆڤ لەکاتی بەئاگاییدا

بترسێت ، هەروەها ئارامی ترسەو ترسیش ئارامییە.

**پارشێو( پاش شێو ):** (نابلسی)دەڵێت: پارشێوی رۆژوەوان بەڵگەیە لەسەر گیرۆدەبوونی دوژمنانو ، تەوبەی گوناهکارو رێنومایی بێباوەڕو رزقو رۆزییەکی کەمو ئاسانە.

**پارەگۆڕەوە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پارەگۆڕەرەوە زانایەکە سوود لەزانیاریەکەی وەرناگرێ لەبۆ بەرژەوەندی دنیا نەبێت.

*هەروەها دەڵێن: ئەو زانایەیە پرسیار وەردەگرێو وەلامەکەی بەدادو هاوسەنگی دەداتەوەو لێکدەرەوەیە بەو ئیعتبارەی وەلامی پێدەداتەوە کەوا کێشو دەستەواژەکەی دیاریدەکات.

*ئەگەر پارەی گۆڕیەوە لای پارە گۆڕەرەوەو دینارێکی گۆڕیەوە چەند درهەمێکی وەرگرت تەماشای حاڵیدەکرێ ئەگەر لەدژایەتیدابوو کەمدەکاتو ئەگەر لەکاڵاوشتو مەکدابوو و دەیفرۆشتو لەخاوەنداری ئەودەردەچێ ، وەگەرنا رووداوێکی پێڕوودەداتو پێویستی بەپرسیارکردن لەزانایەك دەبێت یاخود خەوێك دەبینێو پێویستدەکات پرسیار لەراقەکارێك بکات ، پاشان لەدەرەنجامەکانی ئەوە غەمو پەژارە رووی تێدەکات چونکە درهەمی وەرگرتووەو درهەمو پارە لانەی غەمو پەژارەیەو دڵ لەخشتە دەباتو غەمو پەژارەش لەوەوە سەردەگرێ ، مەگەر سروشتێکی باشی هەبێت لەبینینی پارەدا بەهۆی ئەزموونو تاقیکردنەوەی رابردوویەوە.

*هەروەها ئەگەر زێڕی وەرگرتو پارەیدا لەبری بەهەمان شێوەیە چونکە زێڕ خراپە لەلێکدانەوە.

(نابلسی)دەڵێت:بینینی پارەگۆڕەرەوە بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندیو فراوانی رزقو رۆزی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانای ئاگادارو وردەکاری فەرزو ژمێریاری نووسینو هاوچەشنەکانی.

**پارێزگاریی - چاودێری ( پاسەوانی ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی کەسانیتر چاودێریو پاسەوانی دەکەن دەکەوێتە ئەزموونو تاقیکردنەوە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) مادام یارانی پارێزگاریان لێدەکرد لەتاقیکردنەوەو ناڕەحەتیدابوو ، کاتێکیش خوداوەند دەرووی لێکردەوە بەیارانی وت: "بگەڕێنەوە شوێنو جێی

خۆتان پەروەردگار پارێزگاریم لێدەکات".

* ئەگەر بینی چاودێریو پارێزگاری لەکەسێکیتر دەکا هەتا ستەمو زۆرداری ئەنجامێەدات لەشەڕو خراپەی شەیتان دڵنیا دەبێت بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کەدەفەرموێت : "سێچاو بەئاگر ناسووتێ: چاوێك پارێزگاری بکاتو بێداربێت لەپێناوی خوادا...".

* هەروەها دەڵێن: ئەگەر پارێزگاریکرد لەکەسێکیتر جیهادو تێکۆشانی پێدەدرێت بەپێی ئەو فەرموودەیەی گێڕامانەوە.

(نابلسی) دەڵێت: پارێزگاریکردن لەیادو زیکری خوا یاخود لەو هۆنراوانەی باس لەسیفەتە جوانەکانی پێغەمبەر یان ستایشی پەروەردگار دەکەن بەڵگەیە لەسەر:

+ڕێنومایی دوای وێڵیو سەرگەردانی.

+ڕەواندنەوەی خەمو پەژارە.

+شکۆمەندی.

+منداڵی نێرینە دوای ناهومێدی.

+دەروولێکردنەوە دوای نارەحەتی.

* ئەگەر پادوزیکری کرد بەدەنگەوە پلەوپایەیەکی بڵندو بەرز بەدەستدەهێنێت لەگەڵ ناوبانگو شکۆمەندی ئەگەر شایستەی بێت، وەگەرنا بەشەڕو فیتنە دەناسرێت.

**پاژنە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کوڕێکی قوماربازە، ئەگەر بینی پاژنەی شکا دەمرێ یا غەمو پەژارە رووی تێدەکات یاخود بەڵاو نەهامەتیو قەیران دێت بەسەریا.

* ئەگەر بینی پاژنەی نزمە هێزو تواناو ئازایەتی بەدەستدەهێنێ لەگەڵ بوێریو نەترسان.

* پاژنە بۆ ڕەبەن هاوسەرە.

* ئەگەر نەخۆشێك بینی پاژنەی شکا دەمرێ.

* پاژنەی مرۆڤ ماڵو داراییە ئەگەر نەما ماڵو داراییەکەی نامێنێت.

* ئەگەر پاژنەی خۆی بەجوانیو گونجاو بینی نوقلانەی باشەیە لەهاوسەرگیری یان شەریکایەتی یاخود ئوتومبیلو ئاژەڵو خزمەتکار ، بەڵام ئەگەر پاژنەیەکی ناشیرینو ڕەشو رووشاوو شکاوی بینی دەرەنجامیەتیو دەگەڕێتەوە بۆ پەشیمانیو زەرەر.

* ئەگەر بینی پاژنەی لەبەردەستدایە چەند کچێك دەهێنێ بەپێی ئایەتی: ﴿وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا﴾(النبأ: ٣٣).

**پاسکیل( دووچەرخە ):** (ئەبو حەفس) دەڵێت: ئەگەر خۆی ببینێ بەسواری

پاسکیلێکەوە پێویستی بەیارمەتییە، ئەگەر ماتۆڕبوو بوونی پەیوەندییە لەگەڵ کەسانیتردا بەتایبەت ژنان.

**پاسەوان:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+ئەمن و ئاسایش و پارێزگاری.

+نوێژو خۆر بەنهێنی.

+پاراستن لەشەڕی شەیتان.

+سەگ چونکە پارێزگاریدەکات لەخاوەنەکانی.

**پاسەوانی پادشا:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پاسەوان بەڵگەیە لەسەر ئاشکرابوونی نهێنی و شاراوە.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر یادو زیکری خواو شەوزیندوکردنەوەو نەنووستن و شەونوێژ.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر شەڕو هەڵەکردن لەگوفتارو قسەکردندا.

*پاسەوانی بازاڕو زیندان بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی ئەوەی شاردراوەتەوەو پەنهانە.

**پاسەوانی شەو (حەسحەس):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پاسەوانی شەو ئاگادارییە بۆ یەکێك واز لەنوێژ بهێنێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی هەڵهات لەدەستی حەسحەس و ئەویش دوایکەوت و قسەی لەگەڵداکردو قوتارو رزگاربوو لێی کەمتەرخەمیدەکات لەنوێژی بەیانیدا.

**پاش (دواوە ـ قنگ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پاش ماڵ و دارایی ژنە ، ئەگەر گەورەبوو ژنەکەی ماڵ و دارایییەکی زۆریدەبێ.

*ئەگەر پاشی خۆی بینی بەماڵ و سامانی هاوسەرەکەی دەڕوات بەڕێوەو خێری دەستگیردەبێت.

*ئەگەر پیاوێکی بینی پاشی خۆی بۆ دەرخست و کەمتوانابوو سوودو قازانجی پێدەگەیەنێ پاشان پشتهەڵدەکات، ئەگەر نادیاربوو پشتی لێدەکرێ لەلایەکەوە نازانێ، ئەگەر پیاوێك پشتی دەرخست تا پاشی دەرکەوت خانەوادەکەی ئابڕووی دەبات.

*ئەگەر ژنێکی بینی پاشی خۆی دەرخستبوو هەتا قنگی بینی ئەو کارەی دەدرێتە پاڵی روو لەکۆتایی دەبێت و قەرزی دێتەسەر لەبازرگانی یان دەستەڵاتداری.

*ئەگەر ژنێکی هێناو لەدواوە چوە لای داوای کارێکدەکات لەبارێکی نەشیاوو هیچ سوودی لێوەرناگرێ چونکە چوونە لای ژن لەدواوە بێکەڵ و سوودە.

*ئەگەر بینی بەپاشی رادەکێشرێ ناچار دەکرێ.

**پاشکۆ( جێنشین ـ ئەوەی لەدواوەدێت ):**
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەمنداڵ لێکدەدرێتەوە، ئەگەر بینی لەدوای خۆی کەسی نییە کوڕ ناخاتەوە.

*ئەگەر بینی دوای خۆی شکا یان بچڕا کوڕەکەی دەمرێو لای چەپ بۆ کچانەو لای راست بۆ کوڕان.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+دەرەنجامی مرۆڤ لەئاینو دنیادا.

+ئەوەی مرۆڤ لەدوای خۆی بەجێدەهێڵێ لەماڵو سامان یاخود منداڵ.

*باشی پاشکۆ لەخەودا بەڵگەیە لەسەرکرداری چاکەو ئەوەی مرۆڤ پێشوازی لێدەکات.

*رەشیو گۆڕانی حاڵوباری بەڵگەیە لەسەر رێ ونکردنو گەڕانەوە لەباری گوێڕایەڵی بۆ سەرپێچی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تۆڵەو سزا بۆ یەکێك بەباشی دەستنوێژ نەگرێ چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: " ئاگر بۆ ئەوانەیە قولەپێیان بەباشی ناشۆن".

*ئەگەر قولەپێی بەشکاوی بینی کارێکدەکات لێی پەشیماندەبێتەوە.

**پاقلە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پاقلە پیاوی خاوەن چاکەیە، ئەگەر بینی لەباخەکەی پاقلە لێدەکاتەوە شەڕو خراپە لەژنی نزیكو خزمی رووبەڕووی دەبێتەوە، ئەگەر گوررزە پاقلەیەك بێت ئاگادارییە بۆی هەتا وریابێت لەشەڕو خراپە.

*پاقلەی وشکیش ماڵێکە ماڵی دیکەی پێ چارەسەر دەکرێت، زوربەی خەولێکدەرەوان پاقلە بەغەمو پەژارە دادەنێن.

*پاقلەی جێگرو چەسپاو پیاوە.

*لە(سەعید)ی کوری (مسیب)ەوە دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای دەڵێت: لەخەودا بینیم وەك پاقلەیەکی سەوز لەماڵی خاتوو (عائشە) رواوەو بینەران پێی سەرسامن ، ئنجا (عەبدولمەلیك)ی کوڕی (مەروان) دێتو ئەو پاقلە رواوە هەڵدەکێشێ، (سەعید)یش دەڵێت: ئەگەر خەوەکەت وابێت (حەجاج) (ئەسماء)ی کچی (جەعفەر)ی کوڕی (ئەبی تالیب) تەلاق دەدات چونکە (عەبدولمەلیك) دەترسێ (حەجاج) بەهۆی (ئەسماء)ەوە کەمەندکێش بێت بۆلای ئالو بەیتو خانەوادەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆیە (عەبدولمەلیك) رایسپارد تەلاقیبدا ئەویش بەقسەیکرد.

(نابلسی) دەڵێت: پاقلە لەخەودا ئەگەر تەڕبوو خەمو خەفەتە ، ئەگەر وشکیشبوو ماڵو دارایی نوستوە لەگەڵ فەڕو پیتو شادیدا.

*هەروەها (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی گەزۆو گۆشتی باڵندە بگۆڕێتەوە بەپاقلەو سیر رسوایی‌و هەژاری دێت بەسەردا.

*ئەوەی ببینێ پاقلەی کوڵاو دەخوات خێرو سوودی پێدەگات لەهەمووشتێکداو خۆشی‌و شادی‌و شکۆمەندییەو دەبێت بەسوودو قازانج.

*هەروەها دەڵێن: بەهۆی ناوەکەیەوە کەمییە، ئەوەی ببینێ قڕی دەبێت بەپاقلە ماڵو دارایی روو لەکەمی دەکاتو هەژار دەکەوێت.

*پاقلەی سەوزیش رزق‌و رۆزی‌و بەرگو پاکییە.

**پاقلەفرۆش:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پاقلە فرۆش قسەی خراپو ناخۆش دەکات بەرانبەر خەڵکی‌و ئەوانیش خراپتر دەکەن بەرانبەری.

*هەروەها دەڵێت: پاقلە فرۆش پیاوێکی قسەو وتە سووک‌و نزمەو خاوەن خەمو پەژارەیە.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر رازیبوون‌و قەناعەتو ئارامگرتن‌و رژدی، زۆریشەی دیمەنی پاقلە بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو لابردن‌و لەکارخستن.

**پاڵپێوەنەر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: خزمەتکارێکی غەموپەژارە رەوێنە.

**پاڵکەوتنی مرۆڤ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پاڵکەوتنی مرۆڤ لەخەودا لەسەر گازەرای پشت هێزو توانایە ، یان دنیا رووی تێدەکات ، یاخود دنیا دەکەوێتە ژێر دەستی چونکە زەوی پاڵپشتی بەهێزە.

*ئەوەی ببینێ لەسەر پشت راکشاوەو دەمی ئاوەڵاکراوەو نانی لێ دێتە دەرەوە راو تەگبیر کەمدەکاتو دەوڵەتەکەی نامێنێ‌و بەباروحاڵی دیکە شاد دەبێت.

**پاک‌و بێگەرد:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جوانی‌و چاکی.

**پاوانە( خرخاڵ ):** (نابلسی)دەڵێت: پاوانە لەخەودا بۆ دزو یەکێك لەیەك قاچیدابێت دەگونجێت نهێنی بشارێتەوە ، یان دەویت بێتو لەسەر پەنهانکردن‌و شاردنەوەی ئەوکارانە بروات بەڕێوە.

*پاوانەی زیو کورە ، ئەگەر پیاوێك بینی پاوانەی ئاڵتوونی کردوەتە قاچی

خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر تووشبوونی بەنەخۆشییەك یاخود هەڵەو خراپەیەك دەکەوێتە نێوی.

*پاوانە بۆ ژن دڵنیابوونە لەترس و بیم ئەگەر ئەو ژنە مێرددار بێت ئەگەر شووینەکردبوو شوودەکات بەپیاوێکی سەخی خێرۆمەندو چاکەکار.

*ئەگەر بینی پاوانەیەکی ئاڵتوون و زیوی لەپێکردوە غەم و پەژارەو زیندانی و پاوانکردن رووی تێدەکات.

*وتراویشە: پاوانەی پیاو کۆت و بەندیەتی ، هەروەها هیچ جۆرە خشڵێك بۆ پیاو باش نییە لەخەودا جگە لەملوانکەو ئەموستیلەو ئەڵقەو گوارە نەبێت.

*ئەگەر ژن پاوانەی بەچاکی یا خراپی بینی لێکدانەوەکەی رووبەرووی مێردەکەی و مامەڵەی دەبێتەوە لەگەڵیدا، ئەگەر بێ مێردبوو جوانییەتی بەپێی جوانی قەشەنگی پاوانەکە.

*پاوانەو خاڵ لەخەودا بەرزی پلەوپایەو جوانییە.

## پ ر

**پرد (ریگوزار - پردی سیرات):**

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا رێگەی راست و رەوانە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانداری و رێنومایی و رۆژوو نوێژکردن و هەمووشتێك مرۆڤ بەهۆیەوە لەسزای رۆژی دوایی و ناهەمواریيەکانی دنیا قوتاربیێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خواناسێك بەزیانبێت بۆ خەڵکی یا ئەوەی پێداویستی لەسەردەستی ئەودا بەجێدەهێنرێت وەك دەرگاوان.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر ماڵ و هاوسەرو باوك و دایك، هەموو پردێکیش بەپێی خۆی لێکدەدرێتەوە، پردی سەرشەقام ئەگەر بەبەردو خشت دروستکرابوو دەستەڵاتدارە.

*ئەگەر پردێکی بچووکبوو دەرگاوان یاخود دەویت دەبێت.

*ئەگەر ئەو پردەی بەبەرد دروستکرابوو گۆڕابوو بۆ پردێك بەگڵ دروستکرابێت بەڵگەیە لەسەر گۆڕانی حاڵ و باری ئەوەی بەڵگەیە لەسەری و بەپێچەوانەوە.

*ئەگەر پردی بیناکراو بەگڵ گۆڕا بۆ پردێك بەبەردو خشت دروستکرابوو بەڵگەیە لەسەر خێرو چاکەی زیاد بۆ ئەوەی بەڵگەیە لەسەری، بەڵام ئەوەی خۆی بوو بەپرد دەستەڵات بەدەستدەهێنێت و پێویستی بەپلەوپایەو شکۆمەندی دەبێت.

(نابلسی) دەڵێت: ڕۆیشتن بەسەر پردی سیراتدا لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سەفەرکردن بەدەریادا، ئەگەر هەڵگیرا یاخود بچڕا تیادەچێت یان زەرەردەکات.

*دەگونجێت پردی سیرات بەڵگەبێت لەسەر:

+زانیاری.

+یەکتاپەرستی.

+شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ یەکێك بەسەریا بڕواتو سەلامەت بێت لەسەری.

*سیرات ڕێگەیە ئەگەر بینی قاچی هەڵخلیسکان لەڕێگەی ڕاستو دروست لادەدات.

*ئەگەر بینی لەسەر ڕیگەیەکی ڕاستو ڕەوانە جێگیربووە لەسەر ڕێو ڕەسمەکانی ئاین.

*ئەگەر بینی بەسەر پردی سیراتدا ڕوویی‌و قاچی هەڵنەخلیسکا کارێکی مەزن دەگرێتە دەستو سەلامەتدەبێت تێدا لەوەی لێیدەترسێ.

*ئەگەر بینی چوە سەر سیراتو قاچی هەڵخلیسکا ڕوودەکاتە سەرپێچی لەحەق‌و ڕاستی‌و لادەدات.

*ئەگەر بەسەر پردی سیراتدا بڕواتو لەناوچەی (حیجاز) بێت بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە.

**پردی تاق تاق:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پردێکی نادیار بەڵگەیە لەسەر دنیا، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+کەشتی.

+دەستەلاتدارو فەرمانڕەواو موفتی کاروباری خەڵکی.

+پردی سیرات.

*ئەگەر لەخەودا بەسەر پردێکدا پەڕییەوە لەدنیاوە دەچێت بۆ قیامەت بەتایبەت ئەگەر لەدوای پەڕینەوە مردو یان لانەیەکی نادیاریان بینی، ئەگەر باڵندەیەك هەڵیگرت یان ئاژەڵێك قووتیدا یاخود کەوتە نێوبیرو چاڵێك یا بەئاسماندا سەرکەوت هەموو ئەمە ئەگەر لەکاتی بێداریدا نەخۆشبوو، ئەگەر نەخۆشنەبوو تەماشادەکرێ، ئەگەر لەسەفەردابوو مژدەی سەفەری پێدەدرێ.

*ئەگەر لەسەر پردەکە دابەزی بۆ شوێنێکی بەفەڕ دەچێت یان سوودو قازانجی پێدەگات.

*ئەگەر دابەزییەسەر زەوییەك یاخود مزگەوتێ سەفەرەکەی بەدی دێت، ئەگەر شێر یان ترێ ڕەشکە یاخود کای بینی یاخود لێشاوێك لەسەفەردا خێری دەستگیر نابێت.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گومان، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دنیا بەپێی ئەو فەرموودەیەی هاتووە دەڵێت: " دنیا پردێکە بیپەڕنەوە بەسەریاو ئاوەدانی مەکەنەوە".

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەر بەهۆی چوونە لای و نزیکی لێوەی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ڕەواندنەوەی غەم و پەژارە.

*ڕۆیشتن بەسەر پردا بەڵگەیە لەسەر سواربوونی ئاژەڵ، ئەگەر بەخشت دروستکرابوو بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی حاڵی شار بەهۆی ستەم و گرانییەوە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+دەوڵەمەندی.

+تەمەندرێژی.

+نەخۆشی.

+شکانی بەڵێن و پەیمان.

*پرد پیاوێکە خەڵکی بەهۆیەوە دەگەن بەکاروبار یان پێداویستیان بەجێدەهێنن.

*ئەگەر بینی بەسەر پردێکدا دەڕوات و پردی فەرمانڕەوایە ماڵێکی باش بەدەستدەهێنێ و هاوسەردەگرێ.

*ئەگەر بوو بەپردێك دەسەلات بەدەستدەهێنێ و خەڵکی پێویستیان پێیدەبێ لەگەڵ پێویستی بوونیان بەپلەوپایەو ئەوەی هەیەتی.

*ئەگەر بینی بەسەر پردێکدا دەپەڕێتەوەو پردەکە لەدار دروستکراوە کۆمەڵێك دووڕوون دەچێتە لایان.

**پرسە**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی سەرەخۆشی لەتوشبوو بەلادارێك دەکات هێمنی رووی تێدەکات بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ): ((ئەوەی سەرەخۆشی و دڵنەوایی لەتوشبوویەك بکات هەمان پاداشتی ئەوی بۆ دەنوسرێ)).

ئەگەر وایبینی وەك ئەوەی سەرەخۆشی دەکات ئەوا مژدەی پێدەدرێ بەپێی ئایەتی: ﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ﴾.

(نابلسی)دەڵێت: پرسە لەخەودا بۆنەوەی حاڵ وبلاوباشە بەڵگەیە لەسەر زیانێك رووی تێدەکات، بۆنەوەشی لەحاڵێکی خراپدایە بەڵگەی سوودو قازانجە، بەلام بۆنەوەی مژدەی پێدەدرێ یان خوازیارو داواکاری ماڵ و داراییە بەڵگەیە لەسەر پێویستی بوونیان بەسەرەخۆشی خەڵکی لێیان بەهۆی ئەو بەلاو نەهامەتیانەوە کەروویان تێدەکات.

*پرسە بۆئەوەی لەناڕەحەتیدایە بەڵگەیە لەسەر خۆشیو خێرو ڕەواندنەوەی باروحاڵی ناخۆش.

*پرسە بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونەوە بەڕەوشتی جوانو خۆ خۆشەویستکردن بەراستگۆییو نەرمونیانیو قسەوگوتارو دەربڕینی پرسەو سەرەخۆشی.

**پرسیارکردن( لێپرسین )**: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شوێنکەوتنی شوێنەوارو جێگیربوون لەکاروباردا.

*ئەگەر بینی پرسیاری لێدەکرێ دوای زانیاریدەکەویو پاشان خۆی بەکەمدەزانێ لەبەرانبەر خودایاو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوە.

## پ ز

**پزیشك**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: پزیشك زانایەکی شارەزایە لەئایندا و بەڵگەیە لەسەر چاکەکارو خولگەی ئاینو دنیا وەك زانایانو دادوەرو ئامۆژگاریدەر کەوا ئامۆژگاریەکانی هەتوانو مەڵهەمی زامە دەروونیەکانە ، هەروەها وەك پەروەرشیارو گەورەو ئەو دەباغکارەیە پێستەی ئاژەڵان خۆشدەکات.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر کەڵەشاخگر چونکە کەڵەشاخگرتن چارەسەری تیایە.

*ئەگەر بینی دادوەرێك یان زانایەك بوە بەپزیشك هاوەڵانی زۆر دەبنو فرەسوودمەندەبێ.

*ئەگەر بینی پزیشکێك بوە بەدادوەر یان زانایەك ئەگەر موسوڵمانێکی دانابوو فرەباسدەکرێو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوە لەنێو پیشەوەراندا، ئەگەر بەپێچەوانەی ئەوەوەبوو بەلاو نەهامەتی ڕووی تێدەکات، دەگونجێت بەهۆی نەزانینو سروشتی خۆیەوە کەسێك تیاببات چونکە لەخەودا بۆکارێك بەرزبوەتەوە کەهی ئەو نییە.

*ئەگەر پزیشکێکی بینی کفنی دەفرۆشت بەلوولکراوی بەڵگەیە لەسەر تێکەڵکردنی دەرمانەکانیو بەهەڵەبردنی سەرجەم خەڵکی.

*ئەگەر پزیشکێکی بینی بوە بەپێستە خۆشکار بەڵگەی ژیریو زیرەکیو زۆری ئەوانەیە کەوا لەسەر دەستی ئەودا چاکدەبنەوە، مەگەر ببینێ دەباخچێتیەکەی بۆگەنو خراپبێت ئەوجا پیاوێکی ناپاکدەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: پزیشك لەخەودا وەك زاناو موفتی وایە، ئەگەر بینی پزیشکێ چارەسەریدەکات لەشولاری ساغدەبێت ، ئەگەر بینی زانایەك ئامۆژگاریدەدات دوودڵیو گومانو

دووڕووی لـــــەدڵی دێتـــــە دەرەوەو ئاینەکەی چاکدەبێ.

*پزیـشك زانایـە، هەرکەسـێك شـەڕو ئـاژاوەو بەربـەرەکانی هـەبێت ئەگـەر لەوخەوەدا پزیشکی بینی بەڵگـەکانیان بەڵگەی نەیارەکانیانە بۆیـان، هـەروەك ئـــــەوەی نەخۆشـــــی بینـــــی بەربەرەکانیـــــدەکات بەڵگەکـــــەی چاکبوونەوەیە.

ئەگـەر پزیـشکێکی بینـی خـەڵکی زینـدودەکردەوە پیـشەی پزیـشکی لەوشارەدا فراوان دەبێ لەسـەر ڕێبـازی ئەو پزیشکە.

*پزیـشك دایکـی مرۆڤـە، ئـەوەی پزیشکەکەی بمرێ دایکی دەمرێ.

*ئەگەر پزیشکێ بچێتە لای نەخۆشێك چاکدەبێتەوە ، بەڵام ئەگەر بچێتە لای لەشساغێك نەخۆشدەکەوێ.

*دەگونجێت بینینی پزیـشك بەڵگـەبێت لەسـەر دەرخـستنی شـتی پـەنهان‌و شاراوە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگـەبێت لەسـەر کەنیـسەو ماڵەروگـسکدەری پیـسی‌و جاسـووس‌و سـیخوڕو وەسوەسـەکار، لەگـەڵ ئـەوەی ئامادەکاریـدەکات بـۆ جـەنگ‌و تاوێـك دەبیاتـەوو تاوێـك دەدۆڕێ.

*ئەگەر بینی بوە بەپزیشك دەگونجێت پلەوپایەیـــــەکی بـــــەرزو بـــــاڵا بەدەسـتبهێنێت ، یـاخود دەگونجێـت ببێت بە پـۆلیس‌و خـەڵکی لەفـەرمان‌و ڕێگریەکانی بترسن یان هەوڵی تیابردنی ماڵ‌و ڕوح بدات.

**پزیشکی ئاژەڵ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پزیـشکی ئـاژەڵ پیاوێکـە یارمـەتی سـەربازو گـەورە کەسـان دەدات لەکاروبارەکانیاندا.

*هـەروەها دەڵێن: پزیشك‌و چاکسازو قاچگرەوەیە.

(نابلـسی) دەڵێـت: پزیـشکی ئـاژەڵ لەخـەودا پیاوێکـە خـەڵکی ڕێـزدارو شـــــــکۆمەند دەڕازێنێتـــــــــەوەو لەکاروبارەکانیـدا بـەهێزو پتـەویان دەکـات، بینینیـشی بەڵگەیـە لەسـەر هاوسـەرگیری‌و سـەفەرو لەسـەر فرۆشیارو بازرگان.

## پ ژ

**پژمـە:** (نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا ڕوونکردنـــەوەی کاروبارێکـە گومـانی لەدەورکۆبووبێتەوە.

*ئەگـەر بینـی دەپـژمێ دڵنیادەبێـت لەوەی کەگومانی هەیە لەدەوری.

*پژمە بەڵگەیە لەسەر مەرگی نەخۆش یـان غـەم‌و پـەژارە، ئەگـەر خەوبینـەر لەناڕەحەتیدابوو دەرووی لێدەکرێتەوە،

ئەگەر هەژاربوو پشتگیری وەردەگریّ چونکە خەڵکی قسەی پێدەڵێن‌و دوعای خێری بۆ دەکەن ، دەگونجێت خەوبینەر خەڵکی خزمەتی بکەن.

* ئەگەر قەرزاربوو هەوڵدەدات قەرزەکەی بداتەوە، ئەگەر هەلاّمەتی گرتبوو چاکدەبێتەوە.

* دەگونجێت پژمە بەڵگەبێت لەسەر:

+هەلاّمەت.

+خەشم‌و قین‌و رووگرژکردن.

* ئەگەر بەتوندی پژمی باوریابێت لەدوژمن، ئەگەر جەنگی بەرپاکرد لەگەڵیدا سەردەکەوێت بەسەریاو زیانی پێدەگەیەنیّ.

**پ ش**

**پشتبەستن بەخوا:** (نابلسی)دەڵێت: پستبەستن بەخوا لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گەیشتن بەمەرام‌و مەبەست‌و کۆتایی هاتن بەو ناڕەحەتی‌و نەهامەتیەی هەیە.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+باوەڕهێنان بەپەروەردگار.

+گومانی باش بردن بەپەروەردگار.

+سەرکەوتن بەسەردوژمناندا.

+گەیشتن بەهیواو ئاوات.

+تەوبەو پەشیمانی کەسانی خراپ.

+باوەڕهێنانی بێباوەڕان.

+روودانی ئەوەی مرۆڤ پێشبینی دەکات بەلاّم دەرەنجامەکەی بەخێرو چاکە کۆتایی دێت.

**پشتوێنی جوولەکەکان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پشتوێن‌و جل‌وبەرگی قەشە بەڵگەن لەسەر کوڕ ئەگەر بەسەر جل‌وبەرگی نوێوەبوون، بچڕانی مەرگی کوڕە بەلاّم ئەگەر لەژێر جل‌وبەرگەوەبوو بەڵگەیە لەسەر دووڕوویی لەئایندا، ئەگەر لەگەڵ جل‌وبەرگی خراپدابوو خراپی ئاین‌و دنیایە.

(نابلسی) دەڵێت: پشتوێن سیفەتی خواناسی‌و بەندایەتییە بۆ ئەو مەسیحیەی دەیپۆشیّ‌و بۆ موسوڵمانانیش بەڵگەیە لەسەر ناودانی‌و خۆیەکلاییکردنەوە بۆ خێرخوازی لەگەڵ سەرخستنی ئاین‌و بەرگریکردن لێی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئاگر.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+گەیشتنی تەمەن بەنێوەڕاستی.

+بەڵگەیە لەسەر جل‌وبەرگی نوێوەبوو، ئەگەر لەژێر جل‌وبەرگدابوو بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی دین‌و دنیا.

**پشتهەڵکردن لەجەنگدا:** (نابلسی) دەڵێت: پشتهەڵکردن لەجەنگدا بەڵگەیە

لەسەر نەخۆشییەك لەپاشەوەی مرۆڤدا، دەگونجێت گەڕانەوەبێت بۆ سەر ئەو شەڕو خراپەیەی لەسەریەتی.
*بەڵگەیە لەسەر سەرپێچیو خەشمو قینی خوایی، ئەگەر پشتیهەڵکردو رووبەكۆمەڵێکچوو وەك پەنادانو هاندان لەسەرکوشتار بەڵگەیە لەسەر دووزوبانیو تێکدانی نێوانی خەڵکیو کۆکردنەوەیان بۆئەوکارە.
**پشتی مرۆڤ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پشت ئەو كۆڵەکەیەیە پیاو پشتی پێوەداتو هێزو توانایە بۆی.
*ئەگەر بینی پشتی چەماوەتەوە بەڵاو نەهامەتی رووی تێدەکات، هەروەها دەڵێن: بەڵگەی پیرییە.
*بینینی پشتی هاورێیەك پشت تێکردنو وازهێنانە .
*بینینی پشتی دوژمن دڵنیابوونە لەشەڕی.
*بینینی پشتی پیر پشت لێکردنی دنیاو ئاوابوونیەتی.
*بینینی پشتی لاوو گەنج دواکەوتنی ویستو خوازە.
*بینینی نیوەی پشتی ژن بەڵگەیە لەسەرداواخوازی کارێکی قورسوگران کەبۆی بەجێنایەت.

(نابلسی) دەڵێت: پشتی مرۆڤ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەردەکەوێ یان پێوەی دەردەکەوێ.
*دەگونجێت پشت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی پێوەی دەردەکەوێ وەك پۆشاكوماڵو دارایی.
*پشت بەڵگەیە لەسەر:
+دەرکی ماڵ.
+شار.
+مەزهەبی.
*پشت شکان ترسوبیم یان غەمو پەژارەیە.
*دەگونجێت پشت بەڵگەبێت لەسەر نوێژی نیوەڕۆ.
*ئەگەر بینی پشتی رەش یاسوور هەڵگەڕاوە ترسی لێدانی هەیە، ئەگەر بەقەڵەویو سپێتیو درەوشاوەیی بینی بەڵگەیە لەسەر نوێکردنەوەی جلوبەرگی قەشەنگو جوان.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەرکەوتن بەزانیاری یان کوڕ یاخود دەستەلاتدارێك پشتی پێببەستێ یاخود لانەو ماڵێك.
*پشت بەڵگەیە لەسەر پیریەتی.
*ئەگەر چەمانەوەی لەپشتیا بەدیکرد بەهۆی ئێشو ئازارەوە هەژار دەکەوێو پیردەبێ.

*ژان و ئێشی پشت بەڵگەیە لەسەر [illegible]

*پشت پیاوێکە رووی تێدەکات لەکاروبارەکانیداو خاوەن شکۆمەندیو ماڵو سامانە، ئەوەشی رووده‌دات تێدا لەئێش و ئازارکەمو کوڕی پەناو پشتگیری مرۆڤ و گەورەیەتیو پشتی پێدەبەستیٚ.

*ئەگەر بینی پشتی ئازاریدەدات سەرۆکەکەی کەپیشتی پێدەبەست زیندانیدەکریٚ.

*ئەگەر بینی بەسەر پشتییەوە بارێکی قورس هەڵدەگریٚ ئاینێکی مەزن یاخود دراوسێیەکی خراپە.

*ئەگەر بینیی پشتی شکا هێزی تیادەچیٚو گەورە سەرداری دەمریٚ.

*باری قورس لەسەر پشت غەمو پەژارەیە یاخود گوناهو تاوانە.

*ئەگەر بینی کاڵاوشتومەك لەسەر پشتیبوو قەرزە دەردەکەویٚ بۆی.

*ئەگەر بینی داروتەختە هەڵدەگریٚ غەیبەتو فیتنەیی دەکاتو درۆ دەگوێزێتەوە.

*ئەگەر بینی پشتی شکاو نەخۆشبوو دەمریٚ یاخود بەڵگەیە لەسەر هەژاریو کەمدەستی.

*هەروەها دەڵێن: باری قورس بەسەر پشتەوە زۆری ماڵو منداڵو کەمی ماڵو سامانە.

*ئەگەر کەسێکی پشتکۆمی بینی بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی ماڵ یان تەمەندرێژی ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زۆری ماڵو منداڵو وەچە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی پشتی بەهێزو پتەوە ئەقڵو ژیری پێدەدریٚ، هەروەها دەڵێن: کوڕێکی بەهێزی پێدەبەخشری.

*هەروەها دەڵێن: پشت پیاوێکی بەهێزەو پشتی پێدەبەستریٚ، بەرزی باڵا بەئەندازەیەکی باش بەڵگەیە لەسەر نزیکی چارەنووسو بەسەرچوونی ژیان، هەروەها کورتیشی بەڵگەیە لەسەر تەمەنکورتیو کەموکوڕی پلەوپایەو شانو شەوکەت.

(نابلسی) دەڵێت: دەگونجێت پشت بەڵگەبێت لەسەر پشتو توندی هەمووشتێك یا توانائاداری لەسەر هاوسەرداری کچ بۆ رەبەنو بۆ هاوسەرداریش کوڕە.

*ئەگەر لەپشتی دارێکی تۆکمەو پتەو دەرهات بەهێز دەبێت، ئەگەر

نەخۆشبوو بینی پشتی بوە بەئاسن لەنەخۆشیەکەی چاکدەبێتەوە.

**پشقل:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی پشقلی مەڕ دەماڵێ یان خاوەنیەتی ماڵو دارایی دەستدەکەوێت.

**پشکۆی ئاگر:** (نابلسی)دەڵێت: پشکۆ لەخەودا رزقو رۆزی خێرایەو داوایەکە کۆتایی دێتو رزقێکە بەبێ ماندوبوون دەستگیر دەبێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پارەی ژمێردراو لەکانزا یان لەئاسن یاخود بژێوییەك پێویستی پێی هەبێت.

*دەگونجێت بینینی پشکۆ بەڵگەبێت لەسەر بەدواداچوونی زانیاریو پرسیارکردن لەبارەیەوە.

**پشوو:** (نابلسی) دەڵێت: پشوو لەخەودا دوای ماندوبوون بەڵگەیە لەسەر:

+دەوڵەمەندی دوای هەژاری.

+هاوسەری چاكو باش دوای ناخۆشیو بۆڵە بۆڵ.

*ئەگەر خەوبینەر نەخۆشبوو چارەنووسی نزیکبوەتەوەو لەغەمو پەژارەی دنیا قوتاربوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو بۆڵە.

**پشیلە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا خزمەتکارە مرۆڤ دەپارێزێ، ئەگەر شتێکی برد زەرەری پێدەگات یان بەخانەوادەو منداڵی دز تاقیدەکرێتەوە یاخود بەمامەڵەکارێك کەماڵو سامانی دەگرێ.

*پشیلە ئەگەر دامرکابووساڵێکە تێدا خۆشی دەبینیو پشوودەدات، ئەگەر زۆر دڕندەبوو زەرەرو خراپەی لێوە پێدەگات.

*ئەگەر پشیلەیەکی فرۆشت ماڵو سامان خەرجدەكات.

*هەروەها دەڵێن: پشیلە بەڵگەیە لەسەر ژنێکی قۆڵبڕ. چڕنوكو رووشاندنی پشیلەو گازگرتنی ناپاکی خزمەتکارە.

*هەروەها دەڵێن: گازی پشیلە نەخۆشکەوتنی ساڵێکی تەواوەو بریندارکردنیشی هەربەو شێوەیەیە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: جیاوازی هەیە سەبارەت بەلێکدانەوەیو هەندێکدەڵێن: خزمەتکارێکی پاسەوانە.

*هەندێکی دی دەڵێن: دزی ماڵییە.

*هەندێکی دی دەڵێن: مێینەکەی ژنێکی قاوقیژکاری قۆڵبڕە.

هــــەروەها(ئـــیبن ســـیرین) دەڵـــێ: نەخۆشییە ، ئەگەر پشیلەی کێوییوو خراپترە ، ئەگەر دەڵەپشیلە بێدەنگبوو ئەو ساڵەپشوو خۆشی ئەوی تێدایە ، ئەگەر کێوی زیانبەخشبوو ساڵێکی ناخۆش و پڕ نەهامەتیەو تێدا تووشی ماندوبوون دەبێت.

*دەگێڕنەوە ژنێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: پشیلەیەکم بینی سەریکرد بەنێوکۆشی مێردەکەمداو شتێکی تێدا دەرهێناو خواردی، ئەویش وتی: ئەگەر خەوەکەت بەو شێوەیەبێت ئەمشەو دزێکی زنجی دەچێتە نێو فرۆشگای مێردەکەتەوەو سێسەدو شانزە درهەم دەدزێ، پاشان رووداوەکە بەوچەشنەبوو لەپاڵیاندا حەمامچیەکی زنجیش هەبوو گرتیان داوای پارەکەیان لێکردو گەڕاندیەوە، ئنجا بە(ئیبن سیرین)یان گوت: چۆن زانیت؟ یان بەچ شێوەیەك پەیت پێبرد؟ گوت: پشیلە دزەو ورگو سکیش گەنجینەیەو خواردنی پشیلە دزییە ، سەبارەت بەو برەپارەیەش لەبژاردنی دەستەواژەکان دەرهێنراوە (سین) شەشەو (نون) پەنجاو (واو) شەشە و(را)دووسەرو ئەمەش سەرجەم پیتەکانی وتەی (سنور - پشیلەیە).

(نابلسی) دەڵێت: بینینی پشیلەیەك بفرۆشرێ ماڵو سامان خەرجکردنە، ئەگەر بینی گۆشتی پشیلە دەخوات فێری جادووگەریی دەبێت.

*ئەگەر بینی بوە بەپشیلە بژێوی و رزق و رۆزی لەخۆداگرتن و سیخوڕی پەیدادەکات ، یان لەشتێك هیچ خێرێکی تێدا نییە.

*ئەگەر بینی پیشیلەیەك چوەتە نێو ماڵێك دزێك روودەکاتە ئەو ماڵە ، ئەگەر پشیلەکە بەشتێك رۆیی کتوپڕ هەڵدێت و رادەکات.

*ئەگەر بینی پشیلەیەکی سەربڕی یاخود کوشتی و پێکای زەفەر بەدزێك دەهێت.

*ئەگەر بینی گۆشتی پشیلە یان چەورییەکەی دەخوات ماڵ و سامان بەدەستدەهێنێت یان ئەوەی دەیدزێت.

*ئەگەر کێشمەکێشی لەگەڵ پشیلەیەکداکردو پشیلەکە میاواندی یان گازی لێگرت نەخۆشییەکی درێژخایەن دەگرێت پاشان چاکدەبێتەوەو غەم و پەژارەیەکی توند رووی تێدەکات ، پاشان خوداوەند دەرووی لێدەکاتەوە، ئەگەر پشیلەکە سەرکەوت چاکدەبێتەوە لەنەخۆشیەکەی یاخود لەغەم و پەژارەی.

*ئەگەر پشیلەکە سەرکەوتوبوو نەخۆشیو غەمو پەژارەکە ئێجگار سەختو قورسدەبێ.

*پشیلە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کتێب بەپێی ئایەتی: ﴿ وَقَالُوا رَبَّنَا عَجِّلْ لَنَا قِطَّنَا ﴾ (ص: ١٦).

*دەگونجێت پشیلە بەڵگەبێت لەسەر:

+ژنو ماڵو منداڵ.

+کێشەو ئاژاوە.

+دزیو زینا.

+بێوەفاییو گوێهەڵخستن.

+چاوداگرتنو قاووقیژکردن.

## پ ل

**پلەوپایە:** (نابلسی) دەڵێت: بۆکەسانی ماڵدار بەڵگەیە لەسەر ژنو بژێویو کرداری چاك خوداوەند بەرزیدەکاتەوە.

**پلەوپایەی بەرز:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی دەیەوێت بەرزبێتەوە بەسەر گەلو نەتەوەیەکداو بەرزبووەوە خۆی بەگەورەدادەنێ، پاشان ملکەچدەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿تِلْكَ الدَّارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لاَيُرِيدُونَ عُلُواً فِي الأَرْضِ وَلاَ فَسَاداً وَالعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾(القصص: ٨٣).

*ئەگەر بینی نایەوێت بەرزبێتەوەو خۆشحاڵیو بەرزیو شادی بەدەستدەهێنێ.

(نابلسی) دەڵێت: بەرزبوونەوەو پلەداری لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دابەزینی پلەوپایە، هەندێك لەزانایان دەڵێن: ئارەزووی خۆبەرزکردنی بەسەر خەڵکیدا هەبوو نوشوستیو شکستە بۆی.

**پلیکانە( قاڵدرمە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: قاڵدرمەو پلیکانە بەڵگەیە لەسەر پلەوپایە بەرزیو رووکردنە دنیاو قیامەت.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر پرکردنەوەو پێکەیشتن ﴿ سَنَسْتَدْرِجُهُمْ مِنْ حَيْثُ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾ (الأعراف: ١٨٢) .

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قۆناغەکانی سەفەرو شوێنی سەفەرکاران کەلادەدەن تێیدا قۆناغ بەقۆناغ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رۆژانی تەمەن کەدەگات بەمەبەستی.

*ئەگەر بەپلیکانەو قاڵدرمەیەکی نادیاردا سەربکەوێت تەماشای حاڵو باریدەکرێت، ئەگەر گەیشت بەکۆتاییو نەخۆشبوو دەمرێت.

* ئەگەر لەسەرووی پلیکانەدا گەیشت بەژوورێك رووحیدەگات بەبەهەشت، ئەگەر رێگەی لێگیرا دوای مردن رێگری لێدەکرێت، ئەگەر لەشساغبوو لەسەر سەفەربوو دەگات بەو رزق و رۆزییەی سەفەرەکەی لەپێناودا بۆ ئەنجام دەدات، ئەگەر سەفەرەکەی بۆ ماڵ و سامان نەبوو بەڵگەیە لەسەر خێر.

* موسافیرێك دابەزی لەسەر پلیکانە لەسەفەرەکەی دەگەڕێتەوە، ئەگەر سەرکردەیەکی باسکراوبوو لەپلەوپایەکەی دادەبەزێنرێ و لەکار دووردەخرێتەوە ، ئەگەر سواری ئوتومبیل یان هەر هۆکارێکی گواستنەوە بوبوو دادەبەزێ و بەپێ دەڕوات، ئەگەر هاوسەرێکی نەخۆشی هەبوو تیادەچێت و دەمرێت.

* ئەگەر خۆی نەخۆشبوو تەماشادەکرێت ، ئەگەر لەشوێنێکی ناسراو دابەزی یاخود لای خانەوادەکەی یاخود لای کاوجۆیەکی زۆر یا لای شتێك بەڵگەبێت لەسەر ماڵ و دارایی دنیا لەنەخۆشی و ناساغی چاکدەبێتەوە ، ئەگەر دابەزینی بۆ شوێنێکی نادیاربوو یاخود بۆ شوێنێکبوو نەیدەزانی یاخود بۆ لای گەلێکی مردوو بوو ناسینی یاخود کەوتە چاڵێك یان بیرێکی شاراوەوە داپۆشراو یان کەوتە بەردەستی شێرێك و فڕاندی یا کەشتییەکی لەنگەرگرتوو بردی بۆ نێو کاروانێك بەسەریەوە کەژاوەهەبوو ئنجا بردی پلیکەو قۆناغانە رۆژانی تەمەنییەتی، سەرجەم ئەوەشی دادەبەزێتەسەری مەرگە، کاتێ چارەنووس و ئەجەلی کۆتایی دێت و رۆژانی تەواو دەبێت.

* ئەگەر لەکاتی بێداریدا لەشساغ و تەندروستچاکبوو خۆشی ستەمکارێکی یاخیبوو یان بێباوەڕێکبوو تەماشی دەکرێت کەدێتە خوارەوە بۆی ، ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر چاکی وەك مزگەوت و فەرپیت و باخچەو خۆشۆردن تەوبەدەکات و موسوڵمان دەبێت ، یان ئەوەی لەسەریەتی دادەبەزێت و وازی لێدەهێنێت و لێی دادەبڕێت، ئەگەر دابەزینی بۆ واژوو پێچەوانەی ئەوبوو بەڵگەیەلەسەر:

+کارەگەورەو مەزنەکان.

+ئاگری مەزن و ترسێنەر.

+شێرو مارو رەوگەی تیاچوون.

* نوێکردنەوەی قاڵدرمەو پلیکانە بەڵگەیە لەسەر خراپی ئەو چاکەیەی بەڵگەیە لەسەری، ئەگەر لەخشت

دروستکرابوو چاکدەبێت ، ئەگەر لەخشتی سوور دروستکرابوو خراپە.

*هەندێکدەڵێن: پلیکانەو قاڵدرمە کاری چاکەیە یەکەمیان نوێژەو دووەمیان ڕۆژوەو سێیەم زەکاتو چوارەم خێرەو پێنجەم حەجو شەشەم تێکۆشانو حەوتەم قورئانە. هەموو پلیکانەیەك کرداری خێرو چاکەیە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) : "بخوێنەو پلەپلە بەرزببەرەوە، بەرزبوونەوە تێدا ئەگەر لەقوڕ یان خشت دروستکرابوو چاکی ئاینو ئیسلامەو هیچ خێرێکی تێدا نییە ئەگەر لەخشتی سوور دروستکرابوو".

*ئەگەر بینی بەسەر ژوورێکەوەیەو پلیکانە نییە بەسەریا سەربکەوێت تەواوبوونی ئاینەکەیەتیو بەرزبوونەوەی پلەوپایەیەتی لەلای خوداوەند بەپێی ئایەتی: ﴿ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاء ﴾ (الأنعام: ٨٣).

*پلیکانەی دروستکراو لەقوڕ بۆ فەرمانڕەواو دەستەلاتدار پلەوپایەو شکۆمەندیو مەزنییە لەئایندا، بۆ بازرگان بازرگانییە لەگەڵ ئاینپەروەری، ئەگەر لەبەرد دروستکرابوو بەرزییە لەگەڵ دڵڕەقییدا، ئەگەر لەدار دوستکرابوو دووڕوویيو ڕووپامایيە ، ئەگەر لەئاڵتوون دروستکرابوو دەوڵەتدارییەو خێری دەستگیر دەبێت ، ئەگەر لەزیوبوو خزمەتکاری بەئەندازەی هەر پلیکانەیەك دەستگیر دەبێت ، ئەگەر لەزەرد دروستکرابوو خۆشیەکانی دنیای لەگەڵدا دەستدەکەوێت.

*ئەگەر سەربکەوێت بەسەر پلیکانەیەکدا تێگەیشتنو زیرەکی دەستگیر دەبێتو بەرزدەبێتەوە .

*سەبارەت بەپلیکانەکانیش وتراوە: پیاوێکی خواناسی ئاینپەروەرە ، ئەگەر بینی لێی نزیدەبێتەوە پلەوپایەو خواناسییە بەپێی ئایەتی: ﴿ يَرْفَعُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ ﴾ (المجادلة: ١١) هەموو پلەوپایەیەك بۆ فەرمانڕەوا دەستەلاتی ساڵێکە.

(نابلسی) دەڵێت: دەرکەوتن لەپلیکانەوە کاری مەترسیدارە ئەنجامیدەدات، گرانیو قورسیشی ئاسانکردنیەتی بەئەندازەی دەرکەوتنی، پلیکانەی دروستکراو بەڵگەیە لەسەر ئاسانکردنی کاروبارەکان.

*ئەگەر پلیکانەکان بوو بەدار دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر

جێگیربوون لەسەر کاروبارەکانو شاردنەوەی ئەوەی ئومێدەوارە بیشارێتەوە.

* بەرزبوونەوە بەپلیکانەکاندا پلەوپایەیەکە بەقۆناغبەندی بەدەستی دەهێنێت هێواش هێواش.

* پلەوپایەکانیش پلەوپایەو شوێنی بەهەشتە، ئەوەی بەپلەیەکدا سەریکەوێت بەئەندازەی ئەو پلیکانەیە دەژی. پێنج پلیکانەش هەر پێنج نوێژەکەیە ، ئەوەی روودەدات تێدا کەمو کورییە لەنوێژەکاندا.

**پلیکانەی سەرکەوتن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پلیکانەی دارین پیاوێکی پلەبەرزی دووروەو سەرکەوتن پیایدا بیناسازییە بەپێی ئایەتی: ﴿أَوْ سُلَّمًا فِي السَّمَاءِ فَتَأْتِيَهُم بِآيَةٍ﴾ (الانعام).

* هەروەها دەڵێن: سەرکەوتن پەناگرتنی تێدایە بەکۆمەڵێك کەوا دووروویان لەخۆگرتوە .

* هەروەها دەڵێن: بەڵگەی سەفەرە، ئەگەر پیایدا سەرکەوت هەتا گوێبیستی مرۆڤێك ببێت دەستەلاتێك بەدەستدەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ﴾ (الطور:٣٨).

* پیاوێك بە(ئیبن سیرین)ی وت: لەخەودا بینیم بەسەر پلیکانەیەکەوەبووم ، ئەویش وتی: تۆ پیاوێکی گوێ لەخەڵکی دەگری.

* پلیکانەی سەرزەوی نەخۆشییەو هەڵواسینی لەش ساغییە.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی پلیکانەی دارین لەخەودا ماندوبوونو هیلاکییە بەهۆی سەفەرەوە، دەگونجێت پلیکانە بەڵگەبێت لەسەر سەلامەتی لەکاروباردا، دەگونجێت سەرکەوتن بەپلیکانەی داریندا فەرمانی چاکەبێت بۆ یەکێك پابەندی نەبێت، یاخود رێگری بێت لەخراپە بۆئەوەی رێگری نەکاتو وازنەهێنێت.

* ئەگەر پلیکانە دارینەکە بوو بەبینا دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر جێگیربوون لەسەر کاروبارەکانو شاردنو پەنهانیکردنی ئەوەی مرۆڤ دەبێت بیشارێتەوە.

* پلیکانە دەستەلاتدارە بۆ یەکێك بەدیبکات.

* ئەوەی پلیکانەیەکی تەپیو ببینێ نەخۆشدەکەوێ.

* پلیکانە پارێزگارییە بۆ یەکێك غەمو پەژارەی هەبێت.

*هەروەها بەلگەیە لەسەر سەفەرو پیاوێکی پلەوپایە بەرزە.

*ئەگەر بینی بەسەر پلیکانەیەکی نوێدا سەرکەوت خێرو پلەوپایەی بەرز لەئاین‌و دنیادا بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی هەلزنا بەپلیکانەیەکی دێرین‌و کۆندا خێرو بەرزی‌و سوود لەبازرگانی وەردەگرێ.

*ئەگەر کێشمەکێشی لەگەڵ یەکێکداکرد لێی قوتار دەبێت.

*ئەگەر بینی لەپلیکانەیەکی نوێوە کەوتەخوارەوە فیتنەو ئاشوبی توشدەبێ لەئاینەکەیداو دەگەڕێتەوە لەوەی لەسەرییبووە.

*ئەگەر بینی لەپلیکانەیەکی دێرین‌و کۆنەوە دێتەخوارەوە لەبازرگانیەکەیدا زیاندەکات‌و سوودی دەستگیر نابێت، ئەگەر پلیکانەکە شکاو ئەویش لەسەرییبوو نەیارو دژەکەی لەبەردەستی قوتار دەبێ.

*ئەگەر بینی پلیکانە دادەنێ‌و لێوەی دادەبەزێ بۆ شوێنێکی ناسراو قوتار دەبێ لەوەی لەسەریەتی لەترس‌و بیم‌و لەخۆباییبوون‌و تیاچوون.

**پلیکانەی مامەڵە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەلگەیە لەسەر نوێکردنەوەی رزقێکی دیاریکراو.

*ئەگەر بینی لەخەودا خۆی بانگدەکات یاخود بانگی دەکەن سوودو قازانجی دەستگیر دەبێت یاخود غەرامەدەکرێ.

## پ ڵ

**پڵنگ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پڵنگ وەك شێر وایەو پیاوێکی خراپەکاری نهێنیدارە بەهۆی زاڵبوونی دەروونی ناپاکی.

*دەڵەپڵنگ وەك دەڵەشێروایە.

*هاتنی پڵنگ هاتنی پیاوێکی خراپەکارە ، خواردنی گۆشتەکەشی گوتراوە پلەوپایەو سەرۆکایەتییە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا دەستەلاتدارێکی ستەمکارە یان دوژمنێکی توندوتیژە ئەوەی بیکوژێت دوژمنی کوشتوە، ئەگەر سواری پشتیبوو دەستەلاتێکی مەزنی بەدەستهێناوە.

*ئەگەر بینی پڵنگ سوارییبوە زەرەری لەلایەن دەستەلاتدارەوە پێدەگات.

*ئەگەر دەڵە پڵنگێکی مارەبڕی زاڵدەبێت بەسەر ژنێکی خراپەکاردا لەنەتەوەو کۆمەڵێکی ستەمکارە.

*ئەگەر پڵنگێکی بینی سوودو قازانجی لەپیاوێکی خراپەکارەوە دەستگیردەبێت.

*ئەگەر پڵنگێك گازی لێگرت زیانی پێدەگات بەئەندازەی گازلێگرتنی.
*پڵنگ بەڵگەیە لەسەر پیاوو ژن بەهۆی گۆڕانی دەنگییەوە فرۆفێڵاویە.
*بەڵگەیە لەسەر نەخۆشیو چاوئێشە.
*شیری پڵنگ دوژمنایەتیە بۆئەوەی دەیخواتەوەو سەر هەڵدەدات.
*ئەگەر بینی کوشتار بەرپادەکات لەگەڵی پیاوێك بەوچەشنە کوشتاری لەگەڵ بەرپادەکات.
*ئەگەر پڵنگی بینی لەخەودا داوای لێخۆشبووندەکات لەپەروەردگاری.
*هەروەها پڵنگ بەڵگەیە لەسەر ئەوانەی خەڵکی لێیان دەترسیو ترسو بیمێکی توندوتیژ.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر خەڵکێکی هونەرمەند چونکە دەنگی دەگۆڕێ.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوی قۆڵبڕی گێلو کەودەنە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر راوچیو دەستدرێژیکار.
*بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی رارا هاوەڵایەتیو دوژمنایەتی بەدەر ناخات.
(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر مەزنیو شکۆمەندی لەگەڵ تورەبوونو جەنگو هەرا.
**پلیتەی چرا:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کەیبانوویماڵەو خزمەتی خەڵکیدەکات.
*ئەگەر بینی هەمووی سووتا کەیبانووی ماڵ دەمرێت ، ئەگەر بڵێسەی لێبووەوەو سووتا هەڵەیەکدەکات یاخود قاچی هەڵدەخلیسکێ.
*ئەگەر پڵیتەی چرای بینی کوژایەوە نەخۆشێك لەو شوێنەدا دەمرێ یان هەواڵی کەسێکی نادیار دەبیستێت بەمەرگ یا تیاچوونی.

## پ وو

**پوور( خوشکی باوك یا دایك ) :** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دارخورماکەیەتی، ئەگەر دارخورمای نەبوو یەکێك لەخزمە نزیکەکانیەتی یان باوکی.
*دەگونجێت پووری نازو نیعمەت یا مێزەرو کڵاوەکەی بێت.
**پوولەکەی ماسی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ژنێکە نهێنی خەڵکی دەپارێزێ.

## پ ۆ

**پۆڕ( کەناچە ):** (نابلسی)دەڵێت: ژنێکە زوو ئالوودە نابێتو رانایەت بەلام جوانو قەشەنگەو هاوەڵایەتیکردنی هاوسەرگیرییە لەگەڵی.
*گۆشتی پۆڕ جلوبەرگو پۆشاکە.

*ئەگەربینی پۆرێکی نێرینە دەگرێت منداڵێکی نێرینەی پیرۆزی دەبێتو وەچەی بۆدەخاتەوەو چاوی پێی گەشدەبێت ، ئەوەشی کەناچەی مێینەبگرێت ژنێکی جوانو شۆخو شەنگ بەدەستدەهێنێت بەلاّم هاوتای نییە.

*ئەگەر ژنێکی دووگیان بینی کچی دەبێتو کاروبارەکانیان مەیسەر نابێت.

*ئەگەر بینی کەناچەیەك سەردەبرێت قسەو وتەیەك فێری ژنێکدەکات.

*کۆمەڵە کەناچەیەك ژمارەیەك ژنی زۆرە.

**پۆست( پەیامبەر):** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جموجووڵو سەفەر.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گوناهو تاوانو روو بەمەرگو دنیا بەجێهێشتنو گرتنەبەری هۆکارەکانی مردن.

**پۆستەبەر( پۆستەچی ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پۆستەبەر پیاوێکە ناپاکی لەگەڵ کەسانێکدەکات پشتیان پێبەستووە.

**پۆشاك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پۆشاك ژنێکی ئازادە ، چونکە ژنان بیرخەرەوەی پۆشاکن ، ئەگەر بینی ژنێك پۆشاکێکی سووری شەوقداری هەیە بەگومانو دوودڵی تاوانبار دەکرێت ، ئەگەر لەماڵەکەی چوە دەرەوە ناقۆلاّ دەبێت، ئەگەر لەقاچیدا بەدیکرا سووکترە چونکە تاوانبار دەکرێت بەگومانێك هەولّدەدات تێیدا.

(نابلسی) دەڵێت: پۆشاکی ژن نیشانەیە لەسەر مێردەکەی.هەروەها دەڵێت:لەخەودا حاڵوباری خەوبینەرە.

*ئەگەر بینی مێزەرێکی بەستوە بەقاچی یان بەسەریەوە بەلاّو نەهامەتی رووی تێدەکات.

*<u>جلوبەرگی ژنان</u>: بۆ پیاوی رەبەن ژنە بەپێی جلوبەرگەکەو هی پیاویش بۆ ژن هەر بەوچەشنەیە.

*<u>جلوبەرگی پادشاو وەزیرو میر</u>: شکۆمەندیو بەرزییە.

*<u>جلوبەرگی سەرباز</u>: جەنگەو هی زانایانیش کردارە.

*<u>جلوبەرگی سۆفیەکان</u>: خواناسیو دنیانەویستییە.

*<u>جلوبەرگی بازاڕیی</u>: ماندوبوون یان بێکارییە.

*<u>جلوبەرگی سپی</u>: هەیبەتو شکۆمەندیو شانازییە.

*<u>جلوبەرگی ئاوریشم</u>: پلەوپایەو بەرزییە، ئەگەر بەمردوەوە بینرا ئاوریشمی بەهەشتە.

***جلوبەرگی رووپۆشکراو بەزێڕ:** سەرکەوتنی دوژمنانە.

***جلوبەرگی رەش:** شکۆمەندیو بەرزییە.

***جلوبەرگی سەوز:** گەواهیدانە چونکە جلوبەرگی بەهەشتییەکانە خوداوەند دەفەرموێ: ﴿عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ﴾(الانسان:٢١).

***جلوبەرگی لۆکەو سوفیەکان:** پاکێتییە مەگەر زبربێتو کونجاوو شیاو نەبێت بەوەی لەبەریدەکات ئەوجا هەژاریو ملکەچییە.

***جلوبەرگی رووپۆشکراو:** نوسراوێکی بەرێزە لەگەڵ خۆشحاڵیو شادیدا.

***جلوبەرگی درێژو شۆڕ:** بۆ یەکێك لەبەریدەکان سەرپێچییە، جلوبەرگی کورتیش پاکییە بۆیەکێك شیاوبێت لەگەڵیو پاکێتیە، خوداوەند دەفەرموێت:﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ (المدثر:٤).

***جلوبەرگی کوفی:** کەفارەتە.

***پۆشینی جبە:** تەمەنێکی درێژەو ئەگەر جبەکەش پانو بەرینبوو دەرووی خێرە.

***جلوبەرگی جوانکاری:** ماڵوسامانی هەڵگیراوە یان شتومەك یاخود ژنی داوێنپاکی شۆخو شەنگە.

***جلوبەرگی جەنگ:** غەمو پەژارەیە یاخود خەفەتو دەمەدەمەیە لەنێوان زانایاندا.

**پۆلیس:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا فریشتەی مەرگەو گوتراویشە: غەمو پەژارەو بەڵاو نەهامەتییە.

*پۆلیس ئەگەر هاودەمەکانی لەگەڵ خۆی هێنا ترسو بیمو غەمو پەژارەو سزاو مەترسیەو دەستەلأتدارێکی خراپەکارو گیانداریکی دڕندەی کەڵبەدارە.

*ئەگەر فەرمانڕەوا پۆلیسی بینی کۆمەڵێك بەنددەکات لەنێوان خۆیو ژێردەستەکانیدا ئاژاوەو شەڕ دەکەوێتەوە.



**پەپوولە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مرۆڤێکی لاوازی خاوەن وتەی مەزنو بەنرخە.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نەزانینو نەبوونی ئەزموون لەخزمەتگوزاری فەرمانڕەواو گەورەپیاواندا.

* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر خۆشەویستیو دەروون تیابردن.

* هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر ئاگرپەرست یان ترس‌وبیم بەپێی ئایەتی: ﴿يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ﴾ (القارعة: ٤).

* بۆکشتیارو جوتیاران بەڵگەیە لەسەر بێکاریو ناڕەحەتیو رازیبوون لەگەڵ پیاوخراپانو ناوداری لەگەڵ ژناندا لەسەر داوێنپیسی.

* پەپولەی ئاوریشم بەڵگەیە لەسەر ئەوانەی خێروچاکەی خۆیان بەخشیوەو شەڕیانگرتوەتەبەر، یاخود بەڵگەیە لەسەر منداڵی تەمەنکورت یان خاوەن میراتی، هەروەها دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نزیکبوونەوەی ئەجەلو چارەنووسو بەڵگەیە لەسەر پیاووژنی بەفیزو خۆبەزلزان ئەوانەی چاولێکەرییدەکەن.

**پەت:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر دەستی بەپەتێکەوە گرت ئەگەر بێباوەڕبوو موسوڵماندەبێو ئەگەر کاتێ بەئاگاهات دەستی پێوەبوو بەموسوڵمانی دەمرێت.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+هاوەڵایەتیکردنی کەسێکی زانا.

+کردار ئەنجامدان بەپێی زانیاریو قورئان.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ئاینە ئەگەر دەستی پێوەگرت دەستی بەئاینەوە گرتوە بەپێی ئایەتی: ﴿وَيُؤْمِنْ بِاللهِ فَقَدْ اسْتَمْسَكَ بِالعُرْوَةِ الوُثْقَى لاَ انْفِصَامَ لَهَا﴾ (البقرة: ٢٥٦) پەتو دوگمە بەڵگەن لەسەر هاوسەری پیاو.

(نابلسی ) دەڵێت: پەت لەخەودا پەیمانو بەڵێنە ، ئەگەر پەتێك لەئاسمانەوە شۆڕبوەوە قورئانی پیرۆزە، هەروەها مەزنیو شکۆمەندییەو بەڵگەیە لەسەر هەڵخەڵەتاندنو جادوو.

* پەت ئاینە، ئەگەربینی دەستی بەپەتێکەوە گرتووە دەستی بەڕێبازی خوداوەگرتووە، ئەگەر ئەو پەتە لەریشاڵبێت پیاوێکی رەقو زبرە.

* ئەگەر لەپێستەبوو پیاوێکی خوێنرێژە.

* ئەگەر لەخوریبوو پیاوێکی دیندارو پابەندە بەئیسلامەوە.

* ئەگەربینی توند گوریسەکەی بادا سەفەردەکات.

* ئەگەر توند بایداو خستییە ئەستۆی هاوسەرگیرییە ، ئەگەر لوولیکرد

لەوشارەدا دەستەلاَت و فەرمانڕەوایی دەگرێتەدەست.

*ئەگەر پەتەکە لەمووبوو یاخود لەخوریبوو دەستەلاَت و ئاینداریی و بازرگانییە.

*ئەگەربینی ریشی هەڵدەکێشیّ و بایدەدات و دەیکات بەگوریس و پەت بەرتیل وەردەگرێت لەگەواهیدانی ناحەق.

*هەروەها دەڵێن: پەت هۆکارێکەو ئەگەر پەتەکە لەئەستۆیدابوو یاخود لەسەرشانی یان پشتی بەڵێن و پەیمانێکە دەیخاتە ئەستۆی خۆی ئەویش بەهاوسەرگیری یان پەیماننامەیەك یا نەزرو دینداریی یاخود شەریکایەتی و ئەمانەت.

*ئەگەر پەتێکی بادا یاخود ئەندازەگیریکرد یا پێچای لەدارێکەوە سەفەر دەکات ، هەموو بادان و تێوەئالاَنێکیش بەوچەشنەیە.

*دەگونجێت بادان و لوولکردن و تێوەئالاَن بەستنی کاروبارو شەریکایەتی و هاوسەرگیری بێت.

ئەگەر پەتێك بەدارێکەوە ببینیّ بەلگەیە لەسەر کارێکی خراپ و ناشیاو کەلەجادووەوە دەکەوێتەوە.

**پەتا( درم )**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ئێش و ئازارە روو لەخەلکیدەکات لەلایەن دەستەلاَتدارەوە لەزیندانی و شەڕوپێکدادان.

(نابلسی) دەڵێت: پەتاو نەخۆشی دەردە رێوی لەخەودا بەسەرچوونی پلەوپایەیە.

*دەردە فیل خۆشەویستی دنیایە لەرووێەکی ترەوە.

**پەتی سەر بەئەلقە**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکە پەنای بۆ دەبریّ ، ئەگەر گوریسبوو پیاوێکی پتەوە، ئەگەر لەریشاڵبوو پیاوێکی باشە.

*ئەگەر بینی پەتی سەربەئەلقەیدا بەپیاوێك پەنا بەپیاوێك دەگریّ.

**پەچە( رووپۆش )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: پەچەی ژن مێردەکەی و گەورەو ئابڕو داپۆشەریەتی، فراوانیشی فراوانی حاڵ و بارییەتی و رۆشنیشی ئاین و شکۆمەندییەتی.

*ئەگەر بینی رووپۆشیکردووە لەنێو خەلکیدا ئابڕوو و حەیای تیادەچێت.

*بوونی کەم و کوڕی و ناتەواوی لەرووپۆشدا بەلاَو نەهامەتییە روو لەمێرددەکات، ئەگەر هاوسەردارنەبوو روو لەماڵ و سامانەکەیدەکات.

*ئەگەر پەچەکەی رەش و شڕبوو بەلگەیە لەسەر هیچ و پووچی مێردەکەی و داماوی و هەژاری.

* ئەگەر پەچەکەی کون کوناوییبوو بەڵگەیە لەسەر فێڵو پلانی دوژمنانی ژنو ناشیرینکردنی دیمەنی لای مێردەکەی.
(نابلسی)دەڵێت: کەموکوڕی پەچە بەڵاو نەهامەتییە روودەکاتە مێردی ژنی هاوسەردار ، ئەگەر هاوسەری نەگرتبوو بەڵاو نەهامەتییە روودەکاتە ماڵو دارایی یاخود بژێویدەری ماڵ یان براو مامی.
* ئەگەر پیاوێك بینی دەمامکێکی بەستوە دەچێتە لای خزمەتکارێکی.
* ئەگەر ژنێك بینی پەچە فڕێدەدات لەنێو کۆڕێکی ئاپۆڕەبەستووی خەڵکیدا حاڵوبارێك دێت بەسەریاو ئابرووی دەچێت ، ئەگەر بینی پەچەکەی فڕێدا لەمێردەکەی جیادەبێتەوە، ئەگەر گەڕایەوە بۆی دەگەڕێتەوە لای مێردەکەی.
* پەچە ئاینی مرۆڤە.
(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر خزمەتکار یاخود دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر (حەج)و (ئیحرام).
**پەراسوو:** (نابلسی) دەڵێت: پەراسوو لەخەودا ژنە هەرروداوێکی تێدا رووبدات دەگەڕێتەوە بۆ ئەو.

* دەگونجێت پەراسوو بەڵگەبێت لەسەر خانەوادەو خزمو کەسوکاری جیاواز لەپلەوپایەو تەمەندا بەڵام لەخۆشەویستیو یارمەتیداچوون یەکن.
* پەراسوو بەڵگەیە لەسەرکاری داپۆشراوو ئامرازو پێداویستی چنین.
* هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەو سزاو خۆشیەی پێدەگات.
* ئەگەر بینی پەراسووەکانی لەژێر پێستەکەیەوە بەرزبوەتەوە ترسی سزادانی هەیە، ئەگەرگەورەبوو لەخەودا یاخود رەقبوو گۆشتو پێستەکەی بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزیو قەڵەویو چاکبوونەوە لەنەخۆشی.
* ئەگەر خۆی بەبێ پەراسووبینی لەخەودا ئەوەی پەراسوو بەڵگەیە لەسەری لەخانەوادەو ماڵو کوڕ لەدەستیدەدات.
* دەگونجێت کارێك ئەنجامبداتو وابزانێت باشە بەڵام هەڵەبێت.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چەمانەوە بەهۆی خۆبەزلزانین یان نەخۆشییەوە.
* ئەگەر بینی پەراسووەکانی دەخوات دەبێت بەتەوق لەئەستۆی خانەوادەو خزمەکانیو شتومەكو کاڵای ماڵەکەی

دەفرۆشیٚ لەگەرماو سەرمادا پێویستی پێیەتی.

**پەرداخ**:(ئیبن سیرین) دەلیٚت: پەرداخ ماڵو داراییە لەلایەن ژنەوە دیٚت.

*هەروەها دەلیٚن: پەرداخی ئالتوونو زیوو باشترە بەهۆی مانەوەیان، پەرداخی شووشە کەزوو دەشکیٚ بەلگەیە لەسەر دەرکەوتنی شتی نهیٚنی بەهۆی تیشکەکەیەوە.

(نابلسی) دەلیٚت: پەرداخی پڕ بەلگەیە لەسەر ژنی دووگیان، ئەگەر ئاوەکەی رژا منداڵەکەی لەباردەچیٚ.

*ئەگەر پەرداخیٚکی بەدەستییەوە بینیو لەدەستی کەوتەخوارەوەو شکا بەلام ئاوەکە بەدەستییەوە مایەوە ژنەکەی منداڵیٚکی دەبیٚتو خۆی دەمریٚو منداڵەکەی دەمیٚنیٚتەوە، ئەگەر پەرداخەکە نەشکاو ئاوەکەی رژا کوڕەکە دەمریٚو ژنەکە دەمیٚنیٚ.

*پەرداخ کچەو بەلگەیە لەسەر ریٚقو رۆزیو ئاوخواردن تیٚیداو، وتراویشە: ژنە بۆسەرجیٚ یان منداڵیٚکی تازەپیٚگەیشتوە.

*دەگونجیٚت پەرداخی شووشە بەلگەبیٚت لەسەر توندوتیژی دوای شکانی.

*ئەگەر بینی پەرداخ دەخوات دەکەویٚتە ناڕەحەتییەکی توندەوە.

*ئەگەر بینی پەرداخەکەی شکا بەلگەیە لەسەر مردنی.

(ئیبن سیرین) دەلیٚت: پەرداخ بەلگەیە لەسەر ژنان، ئەگەر بینی ئاوی لەپەرداخیٚك خواردەوە یان لەجامیٚکی باغەدا یاخود لەشووشەبوو خەونەکەی بەلگەیە لەسەر خولقانی منداڵیٚك لەرەحمی دایکیدا.

*ئەگەر بینی پەرداخەکە شکاو ئاوی تیٚیدامایەوە ژنەکە دەمریٚو منداڵەکە دەمیٚنیٚتەوە.

(نابلسی)دەلیٚت: ئەگەر بینی پەرداخیٚکی پیٚدراو نەخۆشیشبوو ئەوەی تیٚدابوو خواردیەوە لەبادەو مەرگو گوژاڵك یاخود ئارامیگرت شەرابی مەرگو دوایی ژیانە.

**پەردە ( بەربەست )**:(ئیبن سیرین) دەلیٚت: زوربەی راڤەکارانی خەو کۆکن لەسەر ئەوەی کەوا غەمو پەژارەیە، ئەگەر لەبەردەرگای خۆی بینی غەمو پەژارەیە لەلای ژنانەوە بۆیدروستدبیٚ، ئەگەر لەبەر دەرکی دوکانو فرۆشگاکەی بینی غەمو پەژارەیە لەئاینەکەیدا دروستدەبیٚ.

* پەردەی کۆن‌و شڕ غەم‌و پەژارەیەکە زوو دەڕەوێتەوە، پەردەی نوێش غەم‌و پەژارەیەکی درێژخایەنە‌و هی کەرت‌و پەرتبووش ئابڕووی هاوڕێکەی دەشکێنێ.

* پەردەی ڕەش غەم‌و پەژارەیە لەلایەن فەرمانڕەواوە تووشی دەبێت، پەردەی سپی‌و سەوزیش دەرەنجامی باشە، سەرجەم ئەم ڕاڤانە بۆ پەردەی نادیارە یاخود لەشوێنێکی نادیاردایە.

* هەندێکدەڵێن: پەردە بەهەموو شێوەکانیەوە بەدەرگاوە غەم‌و پەژارەو دڵنیاییە.

* ئەگەر کەسێکی یاساغ یان ترساو یاخود هەڵهاتوو یانەوەی خۆی شاردبوەوە بینی پۆشاک‌و پەردەیەکی بەسەرەوەیە پەردەو داپۆشەر دڵنیاییە بۆی ، هەرکات پەردەکە گەورەتربێ غەم‌و پەژارەی قورس‌و گرانتر دەبێ.

* ئەو پەردانەی بەدیدەکرێن‌و هەڵنەواسراون لەشوێنی چوونە ژوورەوە یان هاتنە دەرەوە ئاسانترە لەوی باسکراوە ، یاخود ئەو پەردانەی دڕاون یان فڕێدراون خاوەنەکەی دەرووی لێدەکرێتەوەو لەغەم‌و پەژارە دڵنیادەبێت.

(کرمانی) دەڵێت: هەموو پەردەیەک زۆروکەم ئاسک‌و ڕووناک‌و گوڵ گوڵی‌و بێ گوڵ هەمووی ئەگەر بەدەرگاوە یان دەروازەی چوونە ژوورو هاتنە دەرەوە بینرا غەم‌و پەژارەیەکی توندە بۆ خاوەنەکەی‌و لاوازی‌و بچووکییە، بەلاَم پەردەی بچووک غەم‌و پەژارەی سووک‌و کەمە.

* ئەو پەردانەی لەدەروازەیەکی مەزن یان بازاڕێکی گەورەدا هەڵدەواسرێ لەلێکدانەوەدا غەم‌و پەژارەیە.

* پەردەی لوول‌و بادراو لەشوێنی دیاریکراوداو لەکاتی بێداریدا هیچ زیانێکی نییەو هیچ سوودێکیشی نییە هەتا نادیار نەبێ لەکاتی بێداریدا نەیناسێ.

* لێفە بەڵگەیە لەسەر:

+دڵنیایی‌و ماتبوون.

+ژنێك ماڵ‌و حاڵی بۆ بەڕێوە بەرێت.

+ بژێوی‌و ژیان.

* کڕینی پەردەش بەتاك‌و کۆمەڵ دارایی‌و شتومەکی بێبازاڕە گەر لەهاویندابوو ، ئەگەر لەزستاندابوو سوودو قازانجی هەیە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شاردنەوەی کاروبار، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+هاوڕێیەك کاروبارەکانی بشارێتەوە.

+ئەو ژنو هاوسەرەی حاڵو باری مەردوم دادەپۆشێو دەیپارێزێ لەروانین بۆ ژنێکیتر.

*ئەگەر مامۆستابوو بەڵگەیە لەسەر بەرزبوونەوەی ئاستو پلەی ئەوەی بەڵگەیەلەسەری لەهاوسەرو کورو لانە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر پیاوێکی رەبەن پەردەی بینی ژنێك دەهێنێ لەگوناهو تاوانو هەژاری دەیپارێزێ، هەروەها ئەگەر ژنێکی بێهاوسەر بینی بەهەمان شێوازە.

*ئەو پەردەیەی بەدالآندا هەڵدەواسرێ ئەگەر بینی خۆی لەدوایەوە شاردەوە سەفەرێکی دوور دەکاتو زۆرماندو دەبێت لەو سەفەرەیدا.

*پەردەی گەورەو پێداویستیەکانی بەڵگەیە لەسەر بەهانە بەهۆی نێوانی خراپ وەك دەرگاوانو پرسگەو هاوچەشنەکانی.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی پەردەیەکی سپی لەسەر چاویەتی غەمو پەژارە رووی تێدەکاتو ئارام دەگرێ بەپێی ئایەتی چیرۆکی(یەعقوب) (سەلامی خوای لێبێت) لەسپیبوونی چاویدا.

**پەردەو کوڵله:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هاوسەر، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تەمو مژ.

**پەرژینی باخو بێستان:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا چوە نێویو بەروبوومی ئەو باخەش لەجێی خۆی مایەوە بەڵگەیە لەسەر تێچکوونی ئاینو لەکێسچوونی دنیاو رووژانی سەربازو هەڵوەشانەوەی تەوبەو پێشخستنی کەسانی نەزانو پاشگەزبوونەوە لەئاین یان هەڵگەڕانەوە لەمەزهەبێك یان بەرزبوونەوەی خەڵکی گشتیو دابەزینی خەڵکی تایبەت.

*ئەگەر شوێنی دارو درەختبوو بەدیوارێکی تۆکمەو بەهێز لەپەرژینو شوورایەکی قایمو پتەو بەهێزو پلەدارترە بۆ خاوەنەکەی.

*پەرژینی باخ بەڵگەیە لەسەر ئاین چونکە سەرجەم دارەکانیتر ئەرکەکانی دیکەی ئاینە.

*دەگونجێت پەرژینی باخ بەڵگەبێت لەسەر قەڵای پادشاو دارەکانیتر تەواوکاری دەوڵەتەکەین.

*ئەگەر باخو بێستان بەڵگەبێت لەسەرخاوەنەکەی پەرژینەکەی خانەوادەو کەسەنزیکەکانی پیشەکەیەتی.

*ئەگەر باخ و بێستان بەڵگەبێت لەسەر دنیا پەرژین کورەکانیەتی بەرزو نزم و دڵفراوان و بەخشندەو رژدو چروکی تێدایە.

*دەگونجێت پەرژین بەلگەبێت لەسەر ئاینی خاوەنەکەی لەگەڵ کرداری پارێزەری لەسزای دنیاو قیامەت.

**پەرژینی شار( تەیمان ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پەرژین و سنووری شار بەڵگەیە لەسەر دەستەلاتو فەرمانڕەوایی، پەرژینی نادیاریش بەڵگەیە لەسەر:

+ئیسلام و زانیاری و قورئان.

+ماڵ ودارایی.

+دڵنیایی و خواناسی و دوعا.

+هەرشتێك مرۆڤ خۆی لەدوایەوە پەنابدات لەدوژمنان لەئالاو هاوسەرو قەڵغان و گەورەو باوك و هاوچەشنی ئەوە.

*ئەگەر پەرژینی شاری بەرووخاوی بینی فەرمانڕەواکەی دەمرێت یان لەکاردەخرێ.

*ئەگەر فەرمانڕەوای بینی بەپیادە دەڕۆیی سەفەردەکات بۆ ئەوشوێنەی لەخەوەکەدا سەفەری بۆکردووە.

*ئەگەر پەرژینی بۆ خۆی کێشا یان بۆ ماڵەکەی یاخود بۆشارەکەی تەماشای حاڵ و باریدەکرێ، ئەگەر دەستەلاتداربوو لەدوژمنانی بەدوورو پارێزراودەبێ و خراپە لەژێردەستەکانی دووردەخاتەوە، ئەگەر زانابوو بەچەشنی زانیارییەکەی پۆلێنیدەکات و کەسانی دی سوودی لێوەردەگرن، ئەگەر بەندەیەکی خواناسبوو خەڵکی بەدوعای ئەوپارێزراو دەبن و خۆی لەفیتنەو ئاشووب بەدوور دەبێت، ئەگەر هەژاربوو سوود دەگەیەنێ یاخود هاوسەردەگرێ ئەگەر رەبەنبێت و ئەو هاوسەرەی لەفیتنەو ئاشوبی شەیتان دەیپارێزێ.

*ئەگەر پەرژینێکی نادیاری بینی و کون و درزێکی تێکرد هەتا دز چووە شارەوە یان درندە ئەوجا ئیسلام و زانیاری لەوشوێنە لاواز دەبێت ، یاخود کوندەبێتە بنەماکانی ئاین ئەگەر خەونەکەی بەتەنیا بینی ئەوەحاڵ و بارەکە بەتەنیا روودەکاتە ئاینەکەی خۆیی یان ماڵ و سامانی.

(نابلسی) دەڵێت: پەرژینی شار لەخەودا: پیاوانی تێکۆشەرن یاخود دەستەلاتدارو سەرۆکی بەهێزە ماڵ وسامانی دەپارێزن.

*دەگونجێت پەرژینی شار بەڵگەبێت لەسەر زانا یاخود خواناسی ئەوشارە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شەرع کەحەق‌و ناحەق لەیەکجیادەکاتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆشی‌و شادی.

*ئەگەر پەرژین بەڵگەبێت لەسەر بەرپرس‌و فەرمانڕەوای وڵات پەنجەرەو دەروازەکانی شوێنکەوتەکانیەتی.

*ئەگەر پەرژین بەڵگەبێت لەسەر ماڵ‌و سامان پەنجەرەو دەروازەکانی چەک‌و جبەخانەیە.

*ئەگەر پەرژین بەڵگەبێت لەسەر سەرۆك پەنجەرەو دەروازەکان پاسەوان‌و چاودێرانی شەوە.

*ئەگەر بینی چوە نێو پەرژینێکەوە دڵنیاییە لەدوژمنان یاخود خۆپەنادانە لەوەی لێی دەترسێ.

**پەڕاو:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا شایەتیدانە یاخود کۆمەڵە پێشەوایەکە بەهۆیانەوە ڕێنومایی وەردەگرێ، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ (٣٦) وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّىٰ (٣٧) ﴾ (النجم). هەروەها دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ (١٨) صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ (١٩) ﴾ (الأعلى).

*پەڕاو بەڵگەیە لەسەر زانیاری‌و ڕێنومایی‌و هەواڵی ڕاست.

**پەڕەسێلکە:** پیاوێکی پیرۆز یان ژنێکی خاوەندار یا منداڵێکی قورئانخوێنە، ئەوەی پەڕەسێلکە ببات ماڵێکی حەرامدەبات.

*ئەگەر لەماڵەکەی خۆیدا پەڕەسێلکەیەکی زۆریبرد ماڵ‌و داراییەکی حەڵاڵدەبێت.

*هەروەها دەڵێن: پیاوێکی بەئەدەب‌و خواناس‌و لەبز شیرینە.

*ئەگەر پەڕەسێلکەی بینی لەماڵەکەی دێتە دەرەوە خزمەکانی سەفەر دەکەن، هەروەها بەڵگەی خێرو چاکەیە لەکردارەکانیدا بەتایبەت لەڕواندنی دارو درەختدا.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر پەناوپشتگیر.

*هەندێکیتر دەڵێن: ئەگەر بینی بوە بەپەڕەسێلکە دزو جەردە ڕوودەکەنە ماڵەکەی.

*ئەگەر پەڕەسێلکە ببات ستەم لەژندەکات.

*پەڕەسێلکە بەڵگەیە لەسەر خەڵکی گۆرانیبێژ.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+مردن‌و غەم‌و پەژارەیەکی زۆر.

+ئاسایش و پشوو.

*ئەگەر بینی پەرەسێلکەیەکی بەدەستهێناوە لەغەم و پەژارەو تەنیایدا دڵنیا دەبێت ، هەروەها پشوو دەدات لەلای ئەوەی کە ڕووی تێدەکات.

*مردنی پەرەسێلکە ئاگادارییە لەسەرکرداری چاکە.

**پەلکەزێڕینە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ڕەنگی سەوزی پەلکەزێڕینە بەڵگەیەلەسەر دڵنیایی و پاراستن لەنەبوونی و ستەمی دەستەلاتدار، ڕەنگی زەرد بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی، سوور بەڵگەیە لەسەر خوێن ڕشتن، هەندێکدەڵێن: بینینی پەلکەزێڕینە بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری خەوبینەر.

*هەندێکیتر دەڵێن: ئەگەر لەلای ڕاستەوە بینی بەڵگەیە لەسەر خێرو بەپێچەوانەشەوە.

(نابلسی) دەڵێت: پەلکەزێڕینە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دڵنیابوون لەترس و بیم، ئەگەر لەلای ڕاست و چەپەوە بینی بۆ هەژاران بەڵگەی پیت و فەرە بۆ دەوڵەمەندیش نارەحەتیەکە دەرەوێتەوە چونکە بەخێرایی تێدەپەڕێ.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر سەرهەڵدانی کارێکی سەر سوڕهێنەر لەولایەوە تێدا دەردەکەوێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بزاوت و جموجووڵێك لەسوپادا ڕوودەدات و دەرکەوتنی ئالای جۆراوجۆرو ڕەنگاو ڕەنگە، ئەگەر هەورەبروسکەی لەگەڵدابوو دوژمنەو دەردەکەوێ و خەڵکی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خۆیان ئامادە دەکەن.

**پەلەکار:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر سەفەر لەوشکانی و دەریاداو پەلەکاری خێر بۆ یەکێك خێرۆمەندبێ دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بازاڕو بارهەڵگرو ترسێنەرو ئاگاداریکەر.

**پەلەکردن:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پەشیمانییە هەروەك چۆن پەشیمانی پەلەکردنە ، .

*ئەگەر بینی پەلەدەکات لەکارێکدا پەشیماندەبێتەوە.

**پەناوپشتگیر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بۆ ژنان جوانی و ڕازاوەییە، بۆ پیاو هێزو توانایە ، ئەگەر پەناو پشتگیرە لەئاڵتوونبوو بەو شێوەیەیە.

*ئەگەر بەخۆوە بینی بەقامچی لێیدەدرێت تەنگی باشترە لەلێکدانەوەدا.

(نابلسی) دەڵێت: ئەوەی دوو خشڵی زیوین ببینێ براکانی سەر شۆڕو

ملكەچی دەكەن و رەفتاری نابەجێیان لێدەبینن.

**پەنجەتەقان:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خزمایەتی و شەریكایەتی و پەیمانبەستن، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پووچەڵكردنەوەی جموجوڵ و بژێوی پەیداكردن و سەرقاڵبوون لەئەنجامدانی نوێژ.

* ئەگەر بینی پەنجەكانی تەقان ناڕەحەتیەكە لەلایەن خزمەكانیەوە پێیدەگات، دەگونجێت یەكانگیری مەبەست و هیوای بێت.

**پەنجەرەی بچووك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پەنجەرەی بچوك لەماڵدا یان لەژووردا موڵك و دەسەڵاتە خاوەنەكەی بەدەستی دەهێنێ لەگەڵ شكۆمەندی و دەوڵەمەندی، بۆ بەلادار دەرووی خێرە، بۆنەخۆش چارەسەرە، بۆرەبەن هاوسەرە.

* ئەگەر پەنجەرەیەكی بچووكی لەماڵدا بینی لەبەئاگاییدا تێدانەبوو بۆ دەسەڵاتداران دەسەڵاتەو بۆ بازرگان بازرگانییە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ئەگەر دەیڕوانی بەسەر شوێنێكدا لێكدانەوەی موڵك و دەسەڵاتە یان شكۆمەندی و هیواو خوازەو خاوەنەكەی بەدەستیدەهێنێت.

**پەپوسلێمانكە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێكی بینەرە لەكارەكانیداو زانیاری وردودرشتی دەستگیردەبێ. هەروەها ئاینی كزەو ستایش و پیاهەڵدانی خراپەو بۆن وبەرام بۆگەنەو بێزاریشی لەوەدایە هەواڵێكی باش ببیستێ.

(نابلسی) دەڵێت: دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نوێنەرێكی راستگۆی نزیكە لەفەرمانڕەواو سیخوڕ یاخود پیاوێكی زانای فرە مشتومڕكارە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قوتاربوون لەناڕەحەتی و سزاو خەشم و قین.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانیاری و ناسینی خودا یاخود دەگونجێت نوێژێك بێت ئەنجام درابێت.

* ئەگەر پەپوسلێمانەی بینی موسافیرو ئاوارەیەكی دەگەڕێتەوە، دەگونجێت دڵنیایی بێت بۆ كەسێك ترس و بیمی هەبێت.

* ئەگەر پەپوسلێمانكەی بەدەستهێنا یان بوو بەخاوەنی زاڵدەبێت بەسەر فەرمانڕەوادا.

* ئەگەر پەپوسلێمانكەی سەربڕی یاخود زاڵبوو بەسەریا زەفەر بەپیاوێكی لەوجۆرە دەبات.

*ئەگەر بینی پەپوسلێمانکەیەکی مێینەی بەدەستهێنا ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ، ئەگەر سەربیڕی شقڵی کچێك دەشکێنێ.

*ئەگەر پەڕوباڵی پەپوسلێمانکە یان گۆشتەکەی بەدەستهێنا ماڵو سامانێکی خێری دەستگیر دەبێ لەپیاوێکەوە حاڵو باری وەك پەپوسلێمانکە وایە لەلێکدانەوەدا.

**پەرتەوازەو پەرش و بڵاو:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: لەخەودا شتی پەرش و بڵاو کوڕ یان پیاوێکە جگەرگۆشەکەی دەمرێ یان خۆشییەکە بەردەوام نابێت یان دەستەڵاتێکە بەسەردەچێت یاخود بازرگانیەکە دەگوێزرێتەوە یان ژنێکە جیادەبێتەوە.

*شتی پەرش و بڵاو زانیاریو داناییو گوتەیەکی رێکە لەدەقێکی داهێنراودا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر جلوبەرگی گرانبەها یان کۆمەڵو تاقمی مەسیحیەکان یان شوێنەوارو پاشماوەیان.

**پەردە:** (نابلسی)دەڵێت: ژنێکی ئازادی رەوشتبەرزو چاکە یان پیاوێکی دەم و زار شیرینە.

**پەروەرشیار:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خۆیو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژمێریارو شێخو پێشەنگو مامۆستاو زیندانەوانو باوكو دایكو پەروەردەکاری نادیارو بەڵگەیە لەسەر پەروەردەگاری بەمیهرو سۆز کەلەوبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿الرَّحْمَٰنُ ، عَلَّمَ الْقُرْآنَ﴾(الرحمن: ١ـ٢).

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پەروەرشیار بۆ نەزانان.

*ئەگەر بینی بوە بەپەروەردەدار پلەوپایەیەکی باشی بەو ئەندازەیە دەستگیر دەبێت.

*مامۆستای ژمێریاری بیرکاری بەڵگەیە لەسەر ئەقڵو داناییو لێکدانەوەو کەمکردنو زیادکردنو شەڕو خراپە.

*مامۆستای قورئان بەڵگەیە لەسەر گۆرانیو مەلهاو چاکەو رێز.

**پەڕ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵو داراییە ، دەگونجێت پەڕ شەڕبێت.

*دەگونجێت پەڕ بەڵگەبێت لەسەر پلەوپایە چونکە دەوترێ فلان بەباڵ رفی.

*دەگونجێت پەڕ بەڵگەبێت لەسەر :

+کشتوکاڵ.

+کاروکردار.

+پەڕوجلوبەرگ.

**پەز( مەڕ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پەز ژنێکی داپۆشراوی دەوڵەمەندە بەپێی

چیرۆکەکەی (داود)(سەلامی خوای لێبێت).

* ئەگەر پەزێکی مارەبڕی ماڵو سامانێکی لەلایەکیترەوە دەستگیر دەبێ. هەروەها بەڵگەیە لەسەر فەرپیتی ئەو ساڵە.

* سەربڕینی پەز هاوسەرگیرییە لەگەڵ ژنێکداو زاینی بەدەستهێنانی خۆشیو شادیو فەرپیتە، هەروەها چوونە نێو لانەیەکەوە فەرپیتی ئەو ساڵەیە.

* هەروەها وتراوە: چەوری پەز ماڵو سامانی ژنە ، ئەگەر پەزەکەی لەپێناوی گۆشتەکەیدا سەربڕی ماڵوسامانی ژنەکەی دوای مردنی دەخواتو هەڵگرتنیشی بەدەستهێنانی ماڵو سامانە.

* ئەگەر پەزێك بازیدا بەسەریا ژنەکەی فێڵی لێدەکات.

* پەز بەڵگەیە لەسەرئەوەی مانگاو حوشتر بەڵگەیە لەسەری.

* پەزی ڕەش عەرەبییەو هی سپیش عەجەمی.

(نابلسی)دەڵێت: پەزی دووگیان فەرپیتو ماڵێکە کەچاوەڕێیکردوە.

* ئەگەر پەزەکەی بوو بەبەران ژنەکەی هەرگیز دووگیان نابێت.

* ئەگەر بینی پەزێك دەدۆشێ لەژنێك ماڵوسامان بەدەستدەهێنێ، ئەگەر سەریبڕی هەتا گۆشتەکەی بخوات پێداویستی خۆی لەوژنە بەدەستدەهێنێ ، ئەگەر ویستی سەریبڕێ بەبێ ئەوەی گۆشتەکەی بخوات دەیەوێت کچێك بهێنێت.

* ئەگەر پەزێکی بینی لەماڵی خۆی چوە دەرەوە ونبوو یاخود دزرا لەژنەکەی جیادەبێتەوە.

* ئەگەر لەماڵەکەی خۆیدا پەزێکی بینی ساڵێکی پڕ فەرپیت ڕووی تێدەکات، ئەگەر دووگیانبوو خوازیاری کۆکردنەوەی ماڵوسامانە.

* لەدایکبوونی پەز بەدەستهێنانی فەرپیتو خۆشحاڵییە.

* کۆمەڵێ پەز ژنی چاکن، دەگونجێت بینینان بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارە یان لەدەستدانی هاوسەرو تیاچوونی پلەوپایە.

**پەلك** : (نابلسی) دەڵێت: کوڕێکی پیرۆزە بۆ یەکێك هەڵیبگرێت، ماڵو سامانیشە بۆ یەکێك بەدیبکات، هەروەها کچە.

* پرچی ژنان ئەگەر درێژبوو کوڕەکەی دەبێت بەسەرکردەیەكو ساڵیش پڕ فەرو پیتدەبێت، ئەگەر قژی پڕبوو

کارێـــك ئەنجامـــدەدات ناوبـــانگی پێـــدەردەكات، ئەگـــەر خـــەڵكی بـەدییانكرد ئابرووچـوونە، رەشـی قـژ باشی مێردو پلەوپایەیە.

*ئەگـەر ژنێـك بینـی سـەری رووتـە مێردەكەی دەڕوات و ناگەڕێتەوە بۆلای، بـەلآم ئەگـەر مێـردی نـەبوو هـەرگیز شـووناكات، ئەگـەر قـژی خۆشـی بەپرشـنگداری بـەدیكرد بـەماڵی هاوسەرەكەی دەوڵەمەند دەبێت.

**پەلـەكردن ( خێراكـردن ):** (نابلـسی) دەڵێـت: بازدانـە لەشـوێنێكەوە بـۆ شـوێنێكیتر، بەڵگەیـە لەسـەر هـەواڵ و دەنـگو باسـی هەڵبەسـتراو، یـاخود بەرێكەوتن لەگەڵ هاوەلآندا.

**پەنجـەكانی دەسـت:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێت: پەنجەكان برازایە بەپێی ئەو وتەیـەی دەڵێـت: دەسـت برایـەو بەیەكـداكردنی لەبێكاریـدا دەسـت كورتیـە ، سـەرقاڵبوون بـەكاری ماڵ و برازاكانـەوە كارێكـە گروپیـان دەكـات و دەترسـن و بەئاشـكرا دووریـان خستوەتەوە لەخۆیان.

*هەروەها دەڵێن: پەنجـەكانی دەستی راسـت پێـنج نوێژەكەیـەو، پەنجەگـەورەش نوێـژی بەیانیـەو، پەنجەی شەهادەتیش نوێژی نیوەڕۆیە، پەنجەی ناوەڕاستیش نوێـژی عەسرەو پەنجـەی خـرپنیش نوێـژی شـێوان و ئێوارەیـەو پەنجـە تووتـەش نوێـژی خەوتنانە.

*كورتیـــشی بەڵگەیـــە لەســـەر پارێزگـــاریكردن و تەمبـــەڵی ، درێژبوونیـــشی بەڵگەیـــە لەســـەر پارێزگـاریكردن لەنوێـژەكان، كـەوتنی یەكێكیان بەڵگەیە لەسەر وازهێنان لـەو نوێژە.

*ئـەوەی ببینـێ یـەكێك لەپەنجـەكانی چـوەتە شـوێنی یـەكێكیتر ئـەو نوێـژە لەكاتێكی تردا ئەنجامدەدات.

*ئەگەر گاز لەسەری پەنجـەی مرۆڤێك بگرێـت بەڵگەیـە لەسـەر بێڕەوشـتی گـــازلێگیراو زیـــادەڕەوی گـــازگرو بێنەدەبی.

*ئەگـەر بینـی لەپەنجە گـەورەی شیر دێـت و لەپەنجـەی شـایەتومان خـوێن دێـت و لەهـەردووكیان دەخـوات لەگـەڵ خەسـووی یـان ژنخوشـكی جـووت دەبێت.

*تەقاندنی پەنجەكان بەڵگەیـە لەسـەر وتـــەو گوفتـــاری نـــاقۆلآ لـــەنێوان هاوچەشنەكانی.

*ئەگـــەر زیـــادەی لەپەنجـــەكانی پێـشەوایەكدا دی زیادەیـە لـەخواردن و ستەم و كەمی دادپەروەری.

* دەگێڕنەوە (هارون الرشید) فریشتەی مەرگی لەخەودا بینیوەو بۆیدەرکەوتوەو پێی وتوە: ئەی فریشتەی مردن تەمەنم ماوە چەن؟ ئەویش ئاماژەی بەپێنج پەنجەی دەستی نوقاویکردوە ، ئنجا (هارون الرشید) لەترسا هەڵدەستێتو دەستدەکات بەگریانو بۆیەکێك لەخەو لێکدەرەوەکانی دەگێڕێتەوە ، ئەویش دەڵێت: ئەی پێشەوای باوەڕداران ئەوەی پێی راگەیاندووی ئەوەیە پێنج شت بەتەنیا زانیاریەکەی لای خودایەو لەم ئایەتەدا کۆبوەتەوە : ﴿إِنَّ اللهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (لقمان: ٣٤) ئەوجا (هارون الرشید) دڵخۆش دەبێتو بزە دەچێتەوە سەر لێوەکانی.

* پەنجەکانی دەستی چەپیش برازاو خوشکەزایە ، نینۆکیش توانای پیاوە لەدنیادا، پێستی نینۆکیش بەڵگەیە لەسەر خێرایی لەبەرکردنو تێگەیشتن، بینینی نینۆکەکانیش بەشێوەی خۆی چاکی ئاینو دنیایە.

* چارەسەریش بەنینۆك بەڵگەیە لەسەر چاوبەست لەجەمکردنی ماڵو دارایی یان ئامادەکردنی چەك بۆ دوژمن یاخود بەهانەدان بەدەستەوە، یان ماڵێکە خۆی پێ دەپارێزێت لەشەڕیان.

* درێژی نینۆکیش بەئەندازەیەك بترسێت بشکێ بەڵگەیە لەسەر گرتنە دەستی کاروباری لەلایەن کەسیترو تێکدانی.

* ئەگەر نینۆکیکرد زەکات دەردەکات.

* ئەگەر بینی پیرو بەتەمەنێك فەرمانی پێدەکات بەکردنی نینۆکی فەرمانکردنە بەچاککردنی رەچەڵەکی.

(نابلسی) دەڵێت: پەنجەکانی دەست یارمەتیدەرو پەناو پشتگیری مرۆڤە لەدنیاداو ، بۆ پاشەڕۆژیشی یارمەتیدەرە لەکاتێکدا گەر فەرمانی بەچاکەو رێگری لەخراپە کردبێت.

* پەنجەش بەچەشنێ لێکدراوەتەوە کەمناڵو خێزانو باوكو دایكو ماڵو ئاژەڵو دەستەڵاتو پیشەیە ، هەرکەسێك ببینێ پەنجەکانی زیادیان کردوە بەباشی چاکەی زیاد دەکات، هەروەك ئاماژەمان پێدا، ئەوەشی پەنجەکانی کەم بکات یان لەکار بکەوێتو وشك ببێت یاخود سوودیان نەمێنێت بەڵگەیە لەسەر بێسوودی

بـــاوك‌و دایـــك‌و منـــاڵ ، یـــاخود بەفیڕۆچوونی ماڵ‌و تیاچوونی ئاژەڵ یان بازاڕساردی‌و نەمانی ئیش‌وکار.

*دەگونجێت پەنجەکان بەڵگەبن لەسەر جێگرەکانی پادشاو دەستەلاتدار بەپێی پلەو ئاستی هەر یەکێکیان.

*ئـەوەی ببینـێ گـاز لەپەنجـەکانی دەگرێت ئەگەر نەخۆش بێت دەمرێت.

*ئەوەی ببینـێ پەنجـەکانی لـەتبوون یان بەلاو نەهامەتی هـاتوە بەسـەریاندا سـەربازەکانی یـاخود مناڵـەکانی یـان خزم‌و ناسیاوەکانی لاواز دەبن.

(سـیوطي)دەڵێـت: پەنجـە گـەورە (بالابەرزە) بەیانیە بەهۆی ئەوەی درێـژ دەبێتـەوە، پەنجـەی نەهێشت ئـەویش نیوەڕۆیـە ، پەنجـە تووتـەش عەسـرە چونکە کۆتایی ڕۆژە ، ئەگەر پەنجەکان بەنوێـــژ دابنرێـــت نینۆکـــەکان سـونـنەتەکەیەتی، ئەگـەر پەنجـەکان ماڵ‌و سامان بێت نینۆکـەکان زەکاتـە، ئەگـەر پەنجـەکان بەڵگـەبێت لەسـەر سوپاو پـەناو پـشتگیر نێـو پەنجـەکان چـەك‌و جبەخانـەو ژمارەیانـە، گرێـی پەنجەکانیش ڕۆژو مانگ‌و ساڵە.

*دەگونجێـت پەنجـەکان بەڵگـەبێت لەسـەر بـرازا چـونکە شـان برایـەو پەنجەکانش لەشوێنی مناڵـە کەبـەماڵ‌و سامان دادەنرێت.

*ئـەوەی ببینـی مرۆڤێـك پەنجەیـەکی دەبڕێـت ئـێش‌و ئـازاری پێدەگەیـەنێت بەهۆی زەوتکردنـی مـاڵ‌و سـامانیەوە یان ئەو داراییەی پشتی پێدەبەستێت ، ئەوەشـی ڕوودەدات یـان دێـت بەسـەر پەنجەکانـــدا لەچـــاکەو خراپـــە بیگەڕێنەرەوە بۆ ڕێگر لەنوێژەکان یـان برایـەك لـەبراکان. درێـژی پەنجـەش بەڵگەیە لەسەر چاوبرسێتی.

*ئەگەر بینی پەنجەیەك زیادبوە لەگەڵ پەنجـــەکانی دیکـــەی زیـــادبوونی خوێندنـەوەی قورئانـە لەنوێـژدا یـاخود لەوەرگرتنی زانستدا.

**پـەناگرتن بەخوداوەنـد:** (نابلـسی) دەڵێت: ئەوەی لەخەودا ببینێ زۆر پەنا دەگرێت بـەخوا لەشـەیتان پـەروەردگار زانیارییەکی سوودمەندی پێدەبەخشێ، یاخود ڕێنومایی دەکرێت‌و دڵنیا دەبێت لەدوژمنان‌و ناحەزانی.

*ئەگـەر نەخۆشـبوو لەنەخۆشـیەکەی بەئاگا دێت ، بەتایبەت ئەگەر پەرکەمی لەگەڵدابوو.

*دەگونجێـــت پـــەناگرتن بـــەخودا بەڵگـەبێت لەسـەر هێمنـی‌و ئاسـایش‌و دوورە پـەرێزی لـەهاوەڵ‌و هاوبەشـی ناپـاك یـان پـاك‌و تـەمیزیی‌و بـوونی دەستنوێژو پەرێز گرتنی لەبێباوەڕیی.

**پەنیر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پەنیر ماڵو داراییە لەگەڵ پشوودان. پەنیری تەڕ باشترە لەوشكو ماڵێكی بەردەستو ئامادەیە بۆ خەوبینەرو ساڵێكی پڕ فەڕو پیتو بەرەكەتە. هەروەها دەڵێن: پەنیری وشك سەفەركردنە، یەك پارچە پەنیریش كیسەیەكی پڕ لەپارەیە.

*ئەگەربینی نانو پەنیر دەخوات بژێوی بەئەندازەیەك دەبێتو دەڵێن: ئەوەی نانو پەنیر بخوات لەناكاو نەخۆشیو بیمارییەك رووی تێدەكات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژن بەهۆی جوانیو تامو چێژ وەرگرتن لێی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵودارایی بۆ هەموو مرۆڤێك بەئەندازەی خۆی.

*پەنیری سوێرو ترش بەڵگەیەلەسەر ماڵێكی خراپو غەمو پەژارەو داچڵەكان.

*ئەگەر ئەو پەنیرە لەهەر ولاتێك دروستكرابوو بەڵگەیە لەسەر رەوشوكردەوەی ئەو ولاتە، دەگونجێت پەنیر بەڵگەبێت لەسەر شتومەكی زەوتكراو یان هەرشتێك لەلایەن ئەوانەوەبێت.

(نابلسی)دەڵێت: پەنیر لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەستنی گرێی هاوسەرداری بۆ مرۆڤی رەبەنو بۆ دووگیانیش بەڵگەیە لەسەر كوڕو بەڵگەیە لەسەر:

+ماڵێكی بەسوودو قازانج.

+تەمەنێكی دوورودرێژ.

*بینینی پەنیر بۆ جەنگاوەرو بەربەرەكانیكار رقهەڵسانو ترسانە لەرووبەڕووبوونەوە، ئەوەشی لەشیر دروست بكرێت بەڵگەیە لەسەر قوتابوونی ئافرەتانی دووگیانو منداڵبوون.

*پەنیر ماڵێكە بەبێ ماندووبوون بەدەستدەهێنرێت.

*پەنیری وشك رزقو رۆزییە لەسەفەردا، پەنیری تەڕیش رزقە لەكاتی جێنشینبووندا لەشوێنو جێگەیەك.

**پەیكەر:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی پەیكەر لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی لەترسو بیمو سەركەوتن بەسەر دوژمندا، هەروەها بەڵگەیە لەسەر منداڵو هاوسەرو سوودو قازانجو خۆپاراستن لەمامەڵەی دنیاو قیامەتدا.

*بینینی پەیكەری مەسیحیەكان لەدێرەكاندا بەڵگەیە لەسەرئەوەی هەڵدەستێت بەئەنجامدانی نوێژ لەگەڵ ئەوەی لەدێرەكاندا دەخوێنرێ لە(ئینجیل)و ئامۆژگاری.

* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر پەیوەندیو خزمایەتی.

* لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کوڕێك کەبەمناڵی دەمرێت یان خۆشیەك بەردەوام نابێت یا بازرگانیەك دوایی پێدێت یان ژنێك لێی جیادەبێتەوە، یاخود دەستەڵاتێك وادەی تەواو دەبێت هەروەها دەڵێن: پەیکەر ماڵو دارایییە.

**پەیکەرتاشی دار:** (نابلسی)دەڵێت: پیاوێکە مامەڵە لەگەڵ دووڕووانـدا دەکاتو ماڵو سامانیان بەفرووفێڵ لێوەردەگرێ.

**پەیمانگە:** (نابلسی)دەڵێت: ئەوەی رووبکاتە پەیمانگەکەی بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەڵێندەر.

**پەیمانو بەڵێندان:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی لەخەودا بەڵێنیداوە بەخانەوادەی پێغەمبەر(ﷺ) ریشسپیانی شوێنی رێنومایی دەکەویو سروتەکانی ئیسلام دەپارێزیو دەکەوێتەسەر رێبازی راست.

* ئەگەر بینی بەڵێنیدا بەمیرێك لەمیرەکان مژدەیە بۆی بەسەرکەوتن بەسەر دوژمنانداو دەبێت بەکەسێکی تەوبەکاری خاوەن کڕنووش ، ئەگەر بەڵێنیدا بەخراپەکاریێ پشتگیری کۆمەڵێکی خراپەکاردەکات، ئەگەر لەژێرداریکدا بەڵێنیدا دەستکەوت بەدەستدەهێنیێ چونکە رەزامەندی خودای تێدایە.

## پ ی

**پیاز:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەندێك پیاز بەخراپ دادەنێت بەپێی ئایەتی (وبصلها)و هەندێکیش دەڵێت: پیاز بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی شتی پەنهان، هەروەها سەرجەم پاقلەمەنیەکان کەوا بۆنو بەرامیان لەخۆگرتووە. هەندێکیش دەڵێن: پیاز ماڵەو پاککردنی بەڵگەیە لەسەر ماستاوو روپامایی.

(نابلسی) دەڵێت: پیاز لەخەودا بەڵگەی شەڕو خراپەیە بۆئەوەی دەیخوات، ئەوەی ببیفی پیاز دەخواتو نەخۆشبوو دەمرێت، تەڕەپیازیش بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانج لەگەڵ پلانو نەخشەدا، زۆریشی بەڵگەیە لەسەر تەندروستی لەشو لار لەگەڵ خەمو پەژارەو جیابوونەوە ئەوەشی لێی پاکدەکرێت ئەوا بەڵگەیە لەسەر خراپە.

* ئەگەر نەخۆش لەخەودا کەمێك پیازی خوارد بەڵگەیە لەسەر مردنی، ئەگەر

زۆریخــوارد لەنەخۆشـیەکەی قوتــارو رزگاری دەبێت.

*ئەوەی پیـاز بروێنێتو لێی نـەخوات باشە، خۆ ئەگەر لێی بخوات خراپە.

*پیاز ماڵو داراییەکە زیاد دەکاتو بۆ گەشـتیارو موسـافیر بەڵگـەی لـەش ساغیو سەلامەتییە لەسەفەردا.

**پیازی دەشت:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیـــاوێکی خراپـــەکارە بەخراپـــە باسدەکرێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بەدەستەوە بینی دەستدەداتە شتیك باسی خراپەی لێبەدەستدەهێنێ.

**پیاکێشان:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: ئــەوەی ببینــێ سـەری دەکێـشێ بەبەردێکدا دەنوێتو نوێژی خـەوتنان ناکـات ، هـەروەك فەرموودەیـەك لـەم بارەیەوە هاتووە.

(ئـیبن سـیرین) دەڵێت: ئەگـەر بینـی بەقاچ پێیدا دەکێشن نکوولی لێدەگیرێ بەهـــەژاریو نـــەداریو کەســـێك شانازیدەکات بەسەریا بەدەوڵەمەندی.

(نابلس) دەڵێت: لەخـەودا پەرچـدانەوە نکوولییە.

**پیـــاو:** (ئـــیبن ســـیرین) دەڵێـــت: (ئەبوسەعد)(رەحمـەتی خـوای لێبێت) وتویـەتی : ئـەوەی پیاوێـك ببینـێو بیناســـێت خەونەکـــەی بەڵگەیـــە لەسـەرئەوەی شـتێکی لێـوەردەرگرێ، ئەگەر بینـی شتێکی باشی لێوەرگرت ئومێدو هیـوای لێوەبەدەستدەکەوێت ، ئەگەر شایستەی دەستەڵاتبوو بینینـی کراسـێکی نـوێ دەسـتەڵاتو پۆسـتە پێیدەسپێردرێ.

*ئەگــەر پــەتێکی لێــوەرگرت ئــەوە پەیمانو بەڵێنیەتی.

*ئەگــەر بینــی شــتێکی لێــوەرگرت نــەدەبوو لــەهیچ روویەکــەوە لێــی وەربگــرێ ناهومێــد دەبێــت لێــیو دوژمنایــەتیو رقو قــین دەکەوێتــە نێوانیان.

(نابلـسی) دەڵێـت: ئەگـەر ئـەو پیـاوە لەخەودا ناسرابوو ئـەو پیـاوە خۆیـەتی یان برا یا هاوشێوەیە لەنێو خەڵکیدا.

***بینینی نەوەی (ئادەم) لەخەودا:**

بەڵگەیە لەسەر رێزو شکۆ.

***بینینی دادوەران:** دادگاییە.

***بینینـــی دەســـتەڵاتدار:** بەڵگەیـە لەسەر رترسو بیم.

***بینینی سەرباز:** سەفەرە.

***بینینـی پیـشەوەر:** بەڵگەیـە لەسـەر پیشەکانیان لەگەڵ رزقو رۆزی.

***بینینی ژنان:** فیتنەو ئاشوبە.

***بینینی پیاوچاکان:** بەندایەتییە.

* دەگونجێت بینینی نەوەی (ئادەم) بەڵگەبێت لەسەر یادو زیکری پەروەردگار : ﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ الاَّ أُمم أَمْثَالُكُم﴾ (الأنعام: ٣٨).

***بینینی پیاوچاك:** بەڵگەیە لەسەر ئاژەڵو باڵندەی چاكو باش ، هەروەك چۆن ئاژەڵو باڵندەی رامو ماڵی باش بەڵگەیە لەسەر نەوەی(ئادەم).

* دەگونجێت بینینی نەوەی(ئادەم) بەڵگەبێت لەسەر كشتوكاڵی دوراو وەبەرهاتوو : ﴿وَاللهُ أنبَتَكُمْ مِنَ الأَرْضِ نَبَاتًا﴾(نوح: ١٧).

* هەروەها بینینی نەوەی(ئادەم) بەڵگەیە لەسەر گومان لەكاروكاسبیدا بەهۆی جیاوازی كاسبیان یان ساختمانی سەیرو كاروپیشەی باشو لەبار.

**پیاوچاكان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی هەندێك لەپیاوچاكان ببینێ مردبنو لەخەوەكەدا زیندوبووبنەوە ئەو شارە خەڵكەكەی فەرویپتو بەرەكەتو دەروو دادپەروەرییان دەستگیر دەبێو حاڵی فەرماندەو گەورەیان باشدەبێ.

* (حەسەنی بەسری) (رەزای خوای لێبێت) دەبینێت جلێكی خوری لەبەركردوەو لەقاچەكانیدا كۆتو بەند هەیەو عەبایەكی زەردیداوە بەشانیداو لەسەر زبڵدانێك وەستاوەو بەدەستیشیەوە تەپڵێكی پێیە لێیدەداو پشتی داوە بە(كابە)وە ، خەوەكەی بۆ (ئیبن سیرین) گێڕایەوەو وتی: بەرگە خورییەكە دنیانەویستییەو عەباكەت خۆشەویستییە بۆ قورئانو وەستانیش بەسەر زبڵدانەوە دنیایە خوداوەند خستویەتیە ژێر قاچیەوە، لێدانی تەپڵیش بڵاوكردنەوەی داناییە لەنێوان خەڵكیداو پشتدانیش بە(كابە)وە رووكردنە پەروەردگارە. (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا خۆشەویستانی پەروەردگاری بینی یان پیاوێكی لێبینین خۆشویستنی رێبازی ئەوە.

* پیاوچاكان ئامۆژگاریدەرانی هاوەڵنو پیرۆزو ناسراون لەنێویاندا نەناسراو هەیە.

* ئەگەر لەخەودا بینی هەندێك لەپیاوچاكانی ناسراو گۆڕاون شوێنیان دەكەوێت لەرێبازو كۆمەڵداو هەمان شەڕو غەمو پەژارەی تووشدەبێو غەمو پەژارەكانی دنیا سەری لێدەدات بەئەندازەی پلەوپایەی ئەو پیاوچاكە، پاشان زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەكانیدا.

**پیاوچاکانی شوێنکەوتەی یاران (ڕەزای خوایان لێبێت)**:(نابلسی) دەڵێت: هەرکەس لەخەودا یەکێك لەیاران ببینێ لەشاروشارۆچکەیەکدان ئەو شوێنە نەبوونی و بەلاو ترس رووی تێدەکات ، پاشان قوتاردەبن لەوحاڵ وبارەو باروحاڵی سەرۆك و فەرمانڕەوایان چاکدەبێت و ناوبانگی باشدەردەکات.

*بینینی زانایان زیادبوونی زانستی خەوبینەرە.

*بینینی دانایان زیادبوونی داناییە.

*بینینی مۆچیاریدەران زیادبوونی دەروو خۆشحاڵییە.

*بینینی پیاوچاکان زیادبوونی دیندارییە.

*ئەگەر ببینێ زیندبوونەتەوەو رووبانکردۆتە شارەکەی ئەو شاروناوچەکەی فەرپوپیت و بەرەکەت ڕوویان تێدەکات و دەروویان لێدەکرێتەوە.

*ئەگەر ببینێ پیاوێك لەوپیاوچاکانە زیندوودەکاتەوە زیندووکردنەوەی خووڕەوشتی ئەوانە.

*ئەگەر ببینێ بووە بەوپیاوچاکە ناسراوانە بەڵگەیە لەسەر چەشتنی غەم و پەژارە لەدنیاداو بەئەندازەی پلەوپایەی ئەو پیاوچاکە ، ئنجا بەهیواو ئاواتی خۆیدەگات.

**پیر( بەساڵاچوو )**:(نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر رێنومایی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانایەك خەڵکی پەیوەندی پێوەبکەن یاخود ئەو ئاگردانەی ئاسنی لێدێتەدەرەوە.

*پیر پیاوێکە هانی خەڵکیدەدات لەسەر کاروبارەکان یاخود بەڵگەیە لەسەر کاری سێکسی دووژن لەگەڵ یەکدا یان بەڵگەیە لەسەر جموجووڵ و نەفس باشی.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی خۆی رازاندوەتەوەو دیارە بەخێرایی دنیای بۆ فەراهەمدێت.

*ئەگەر بەرووبەکی گرژەوە بینی بەڵگەیە لەسەر بەسەرچوونی پلەوپایە بەهۆی دنیاوە، ئەگەر ناشیرین بوو کاروبارەکانی پێچەوانە دەبنەوە، ئەگەر بەرووتی بینی رووداوێکی پەشیمانهەڵگرە.

*ئەگەر بینی پیرێك خۆیکرد بەماڵەکەیدا دنیا رووی تێدەکات، ئەگەر بینی لێیهاتەدەرەوە دنیا پشتی تێدەکات، ئەگەر پیرەژنێکی ناموسوڵمانبوو دنیایەکی حەرامدەبێ، ئەگەر ناقۆڵاو ناشیرینبوو هیچ خێرێکی تێدانییە.

* پیری نادیار لەلێکدانەوەدا بەهێزترە، ئەگەر ژنێکی لاوبینی لەخەودا پیربوە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر باشی ئاینی.

* ئەگەر پیاوێك پیرێکی بینی بەگوێی ناکات ئەویش ئارەزوویدەکات دنیایەو بۆی فەراهەم نایەت، ئەگەر بەگوێیکرد بەئەندازەی بەگوێکردنی بەدەستیدەهێنێت.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا نەتوانینە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دنیای بەسەرچوو و غەمو پەژارە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قیامەت چونکە واژووی دنیایەو بەڵگەیە لەسەر مەی چونکە لەناوەکانیەتی.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر مانگا.

* دەگونجێت پیر لەخەودا دووگیانیی بێت دوای نائومێدی.

* دەگونجێت خەوی پیر بەڵگەبێت لەسەر پلانو دەستبڕینو چاوداگرتنو فرۆفێڵ.

* پیرە ژنی نەخۆش نەتوانینە، تینوویەتیش نەبوونییە، ئەگەر گەنجبووەوە نەبوونیو قاتو قڕی دەڕەوێتەوە.

* ئەگەر پیرێکی نادیار چوە لای نەخۆش ترسی مردنی هەیە، بەڵام بەڵگەی باشەیە بۆ دووگیان.

* ئەگەر پیرێکی راوەستاو لەئارەزووی سێکسی بینی ئارەزووی شووکردنی هەیەو توانای یەکەمجاری بۆ گەڕاوەتەوە بنەماکانی ئاینەکەی پتەودەبێو دنیاشی بەهەمان شێوە دەبێ ، ئەگەر شووکردنەکەی حەڵاڵبێ، ئەگەر حەرامبوو دنیایە بەئەندازەی ئەوە.

* ئەگەر خوێنی منداڵبوونی هەبوو بینی پیرێك دەچێتەلای ناتوانێ ئەوکارە ئەنجامبدات یا خواستو ویستی بەجێنایەت.

* پیر بەڵگەیە لەسەر زەوییەکی بێفەڕ کەرووەکی تێدا ناڕوێت، ئەگەر بینی کونکراوو هەڵکەنراوبوو غەمو پەژارەو پەشیمانییە.

* ئەگەر پیرێکی ناشیرینی بینی بەڵگەیە لەسەر فتنەو جەنگ ، پیری بێباوەڕیش ماڵی حەرامە.

* پیری باوەڕدار ماڵێکی حەڵاڵو خۆشحاڵییە ئەگەر بینی.

* ئەگەر بوو بەپیرێك ویقارو شکۆ بەدەستدەهێنێ، پیری نادیار بەڵگەیە لەسەر ساڵی فەڕوپیتدار.

* دەگونجێت پیری ناقۆڵاو ناشیرین مژدەبێت بەڕەواندنەوەی جەنگو نەبوونی.

*پیری لەرو لاواز سالّی نەبوونییە، ئەگەر قەڵەوبوو یاخود گۆڕایەسەر شێوەیەکی باش سالّێکی پڕکارو بژێوی دادێت.

**پیرۆزە**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: سەرکەوتنو تەمەندرێژییە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەدەستمدا ئەموستیلەیەکی پیرۆزە یاقوتی سوورم بینی، ئەویش وتی: ژنێکی شۆخو شەنگو جوان حەز لەتۆ دەکات بەلاّم رەوشی زبرو رەقە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ژنێك چەقۆیەکی بەدەستی خۆیەوە بینی دەسکەکەی پیرۆزەبوو کوڕێکی تەمەندرێژیدەبێت.

**پیری( بەسالاّچوون )**:(ئیبن سیرین) رقی لەهەموو سپیبوونێکی مووی لاو دەبویەوەو دەیوت: پیری هەژارکەوتنو غەمو پەژارەیە ئەگەر موەکەی درێژبوو، ئەگەر هەژارێك خەوێکی ئاوای بینی لەگەڵ هەژارێکەیدا قەرزی لەسەر کۆدەبێتەوە وێڕای بەندکردنی.

*ئەگەر بینی مووە سپێکانی هەڵکێشا پێچەوانەی سوونەت دەبێتو گاڵتەو سووکایەتی بەشێخدەکات.

*ئەگەر لاوێك سپێتی لەقژیدا بەدیکرد کەسێکی سەفەرکردوی دەگەڕێتەوە لایان.

*هەروەها دەڵێن: مووی سپیو پیری لەلێکدانەوەدا زیادبوونی ویقارو ئاینە یان تەمەندرێژییە بەپێی ئایەتی: ﴿ ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخًا ﴾ (غافر: ٦٧).

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی قژی سپیبوە منداڵێکی دەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿ واشْتَعَلَ الرَّأسُ شَيْباً ﴾ (مريم: ٤).

*دەگێڕنەوە (حەجاج)ی کوڕی (یوسف) بینیویەتی سەرو ریشی سپیبوە ، ئنجا (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) تووشی غەمو پەژارەبوو حاڵوباری دەروونی گۆڕا.

*ئەگەر ژن بینی سەراپای سەری سپیبوە بەڵگەیە لەسەر خراپیو تێکچوونی مێردەکەی، ئەگەر مێردەکەی باشبوو دەیگۆڕێ بەژن یاکچێکیتر، ئەگەر بەو چەشنە نەبوو غەمو پەژارەی لێوە دەستگیر دەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر لاوازیو بەڵگەیە لەسەر هەژاری ئەگەر سەرو ریشی داگیرکرد.

*ئەگەر مووی سپێتی بەریشییەوە بەدیکرد هێزو شکۆو ویقارو چاکەیە.

*ئەگەر سەری سپیبوو ژنەکەی دووگیانبوو کوڕێکی دەبێت.
*ئەگەر مووسی سپی لەریشی هەڵکێشا یاخود بڕی ڕێز لەریش سپییان دەگرێ.
*سپیبوونی مووی سەر گەڕانەوەی کەسی موسافیر یان میوان رووتێکردنە.
*سپیبوونی مووی لەش و لار بۆ دەوڵەمەند بەڵگەیە لەسەر زەرەر لەماڵداو بۆ هەژار قەرزەو ناتوانێ بیداتەوە.
*سپیبوونی مووی ژنێکی نادیار وشکبوونی کشتوکاڵە.
*سپیبوونی مووی سەربازان هەڵهاتن و لاوازییە.
*سپیبوونی مووی نەخۆش مەرگو کفنکردنیەتی بەتایبەت ئەگەر مووسی لاجانی سپیبوو.
*سپیبوونی مووی کەسێکی ترساو دڵنیاییە لەدەستەلاتدارو فەرمانڕەوا.
*هەروەها دەڵێن: سپیبوونی مووی ژن قسەیەکی ناقۆڵایە لەخزمەکانی ژنەکەی دەبیستێ.
*بەڵگەیە لەسەر تەلاقدانی ژن چونکە پیاو رقی لەسپیبوونی مووی ژندەبێ.
*ئەگەر بینی لەسەروو سپیبوونی مووی ئاسایی خۆی مووی سپی زیادیکردبوو لەنێو سپییەکەدا رەشی هەبوو ویقارە، ئەگەر بەرەشی نەمایەوە لەفەرمانڕەوا یا بەرپرس یا کەسێکی سەرووی خۆیەوە رەفتارێك دەبینێ رقی لێدەبێتەوە.
*ئەگەر کەسێکی ریش رەشی بینی ریشی سپیبوە ئاینەکەی یا ماڵ و سامانی تیادەچێت.
*ئەگەر کەسێکی ریش رەشی بینی مووی سپی تێکەوتوە لەیەك موو بۆ سێ منداڵێکی نێرینەی دەبێت ، ئەگەر کەسێکی غەریبی هەبێت و ئاوودەی بێت دەگەڕێتەوە بۆ لای.
*ئەگەر مووی سنگی بینی سپیبوە خواردنەکەی دەگۆڕێ و بۆگەندەکات.
*ئەگەر بینی ریشی سپیبوەو تیشك و رووناکیدەداتەوە مەزنی و پلەوپایە بەدەستدەهێنێ و بەباشی باسیدەکەن لەو ولاتەدا.

**پیرێکی نادیار:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بینینی پیرو پشت چەماوەی نادیار بەڵگەیە لەسەر باپیرەی پیاو، ئەگەر بینی یاخود یەکێکیانی بینی بەلاوازی کزی و لاوازی باپیرەیەتی.
*ئەگەر لاوێکی بینی بوە بەپیاوێکی پیر ئەوە زانیاری و ئەدەبە.
*ئەگەر بینی دوای پیاوێکی پیرکەوتوە دوای خێرو فەرپیت دەکەوێت.

*ئەگەر پیاوێکی بەتەمەنی بینی هات بۆی تواناییدەداتێ لەبۆ بەجێهێنانی خێرێك، ئەگەر لاوێك هات بۆلای دوژمنێکەو زاڵیدەکات بەسەر خۆیدا.

*ئەگەر پیاوێکی بەتەمەنی بینی لاوبوەوە جیاوازی هەیە لەلێکدانەوەی خەوەکەیدا، هەندێکدەڵێن: خۆشیو شادی بۆ نوێدەبێتەوە، هەندێکیتر دەڵێن: لەئاینو دنیایدا کەمو کوڕییەکی گەورە سەر هەڵدەدات، هەندێکیتر دەڵێن: خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر سووربوونی چونکە دڵی پڕ لەچوستوچالاکیو هیواداریە.

*ئەگەر بینی بوە بەپیاوێکی پیرو لەکاتێکدا لاوبوو ویقارو هەیبەتە بۆی، هەروەها ژنیش ئەگەر بینی پیربوە لەکاتێکدا لاوبوو بەو چەشنەیە.

*پیرێکی بێباوەڕ دوژمنێکی دێرینەو رقو قینی دیارو بەرچاوە، پیری مەجوسی دوژمنە نایەوێت دژومنانی تیابچێت.

*پیرێکی جوولەکە دوژمنێکە دەیەوێت نەیارەکەی تیابەرێت.

*پیرێکی مەسیحی دوژمنەو دوژمنایەتیەکەی زیانی نییە.

*کچی بێباوەڕ خۆشحاڵییە لەگەڵ غەمدا.

*ئەگەر بینی ئاینەکەی تێکچوە هەڵدەدەکات بەرانبەر خەڵکیو ئازاریاندەدات، هەروەها ئەگەر بینی نەزانبوو ئاینەکەی تێکدەچێ بەپێی ئایەتی: ﴿ وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللهِ شَطَطًا ﴾ (الجن: ٤).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر پیرێکی نادیاری بینی رقی لێبوو هاوڕێیەکی ئامۆژگاریدەکات بەلام پەسەندیناکات.

*ئەگەر بینی پیرێکی خۆشدەوێت ئامۆژگاریدەکاتو چوونیەکدەبێ لەگەڵ ئاینو دنیایدا.

*ئەگەر کۆبوونەوەی چەند نەتەوەیەکی هاوڕێی بینی لەخۆشیو تەباییداو نەیزانی پیرو لاوەکان کێن دەرگاکانی خێری بۆ ئاوەلادەکرێ.

*ئەگەر ژن پیرێکی بینی لەخەودا دنیاکەیەتی.

*ئەگەر لاوێك یان نێرەموکێ بینی بوە بەپیرێك زانیاریو ئەدەبی دەستگیردەبێت.

*پیرێکی نادیار لەخەوداو ئەگەر دوا لەگەڵیدا یاخود بڕیاریدا بەسەریا مەزنیو شکۆمەندییە.

*ئەگەر پیرێك دایکی بینی هێنایە بوون ئەگەر نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر مردن، ئەگەر لەشساغو هەژاربوو

دەرووی لێدەکرێتەوەو، ئەگەر دەوڵەمەندبوو تەنگی پێهەڵدەچنرێ.

*ئەگەر پیرێك بینی بوە بەمندالٚ چاوی لێدەپۆشرێ لەکارێکدا ئەنجامیدەدات.

*پیری پیاوباش بەڵگەیە لەسەر:

+مەزنیو شکۆ.

+رێزو شەرەف.

+رزقو رۆزیو بەرەکەت.

+تەمەندرێژی.

*پیرێکی پشت چەماوەو بەساڵاچوو خەیاڵو ئەندێشەیە.

*دەگونجێت بینینی بەتەمەن بەڵگەبێت لەسەر:

+نەتوانین.

+شکستو دۆڕان.

+تەمەڵیو دانیشتنو نەتوانینی ئەنجامدانی جموجووڵ.

+لاوازی.

**پیسایی( پاشەڕۆ)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەروەها دەڵێن: رزقو رۆزییە بەستەم دەستگیردەبێ، هەروەها دەڵێن: بەڵگەی دەروە.

*ئەگەر بینی چوە سەر ئاو غەمو پەژارەی دەڕەوێتەوە، ئەگەر ماڵو ساماندرابوو ماڵو سامانەکەی پاکدەکاتەوە.

*ئەگەر بینی پیساییکردو زۆربوو لەسەر سەفەربوو سەفەر ناکاتو رێگەی لێدەگیرێ.

*خواردنی پیسایی بەدەستهێنانی ماڵو سامانی حەرامە، وێرای بوونی پەشیمانی، دەگونجێت وتەیەك بێت پەشیمان ببێتەوە لێی.

*ئەگەر پیسایی رەقیکرد هەندێك لەماڵەکەی خەرجدەکات، ئەگەر پیساییەکەی شلبوو ماڵو دارایی گشتی خەرجدەکات.

*ئەگەر سەرپێشاوەکەی ناسراوبوو وەك شوێنی دەستنوێژ خەرجیەکەی لەپێناوی ئارەزووی خۆیدایە، ئەگەر نادیاربوو ماڵو سامانی حەرام خەرجدەکات لەکارێکدا خۆشی نازانێت چییەو سوپاسو پاداشت نادرێتەوە.

*هەموو پاشەڕۆیەك لەمرۆڤو ئاژەڵ بێتەدەرەوە ماڵو سامانی حەلاڵو حەرامە بەئەندازەی بۆنو پیسییەتی لای خەڵکی.

*ئەگەر لەجلەکانی خۆیدا خۆی پیسکرد کارێکی خراپی ئەنجامداوە.

*ئەگەر خۆی پیسکرد لەشەرواڵەکەیدا توڕەدەبێ لەهاوسەرەکەیو مارەییەکەی لێدەگرێتەوە.

*ئەگەر بینی لەشوێنێکدا پیساییدەکاتو بەخۆڵ دەیشارێتەوەماڵو سامان دادەپۆشێ.
*ئەگەر پیساییکرد بەخۆیدا دەکەوێتە هەڵەوە.
*ئەگەر پیساییکرد لەسەر جێگەکەی نەخۆشییەکی درێژخایان دەگرێ، هەروەها خەونێکی لەو جۆرە بەڵگەیە لەسەر جیابوونەوەی ژن لەمێردەکەی.
*ئەگەر نانی بەپیساییەوە خوارد بەڵگەیە لەسەرئەوەی هەنگوین دەخوات لەکاتی بێداریدا، هەروەها دەڵێن: واژوویبوونی سوننەتە، ئەگەر بەبێ هۆ پیسیاییکردو پیساییەکەی بەدەستەوەگرت کیسەیەك دینار بەحەرام بەدەستدەهێنێت بەپێی پیساییەکەی.
*ئەگەر بینی پیساییدەکات لەبازاڕ یان لەگەرماوو حەمامو نێو کۆمەڵدا بەڵگەیە لەسەر خەشمو قینی خودا لێی لەگەڵ خەشمو قینی فریشتەکانو ئابڕووچوونێکی گەورە رووی تێدەکات لەگەڵ زەرەو دەرکەوتنی ئەوەی پەنهانو شاراوەیکردوە.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر کەموکورییەك روو لەخاوەنەکەیدەکات.

*ئەگەر لەزبڵگەیەك پیساییکرد یان لەسەر کەناری دەریا یاخود لەشوێنێك نکوولی لێنەکەن بەڵگەیە لەسەر خێرو بەسەرچوونی غەمو پەژارەو ئێش وئازار.
*ئەگەر بینی مرۆڤێکی ناسراو خۆڵو پیسی خەڵکی تێدەگرێ بەڵگەیە لەسەر دژایەتیو جیاوازی لەراوبۆچووندا و ستەمو زوڵمێك لەو کەسە تێیگرتوە.
*زۆری زبڵو خۆڵی خەڵکی بەڵگەیە لەسەر وەستانی جموجووڵو رووتێکردنی مەترسییەکی گەورەو پیسبوونیش بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی یان ترسو بیمێکی گەورە.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر خێرو بۆ یەکێك کردوەکانی خراپبێت.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵو سامانە ئەگەر یەکێك بینی پیساییەکی رەقدەکات ئەوە ماڵو سامانێکە بەلەشساغی بەدەستیدەهێنێت.
*پیسایی شل بەڵگەیە لەسەر سوودێکی گەورە، ئەگەر پیساییکردو خەڵکی تەماشایاندەکرد باوریابێت لەئابڕوچوونو ئاگاداری قسەی خراپو ناقۆلا بێت.
*ئەگەر بەبێ هۆ پیساییکردو پیساییەکەی هەڵگرت دەیەوێت دینارو

پـــاره بەئەنـــدازەی پیـــساییەکەی وەربگریٚ.

*ئەگەر بینی نان‌و پیسایی بەیەکەوە دەخـوات نـان‌و هـەنگوین دەخـوات‌و وتراویـــشە پێـــچەوانە جوولاَنـــەوەی سوننەتە.

*ئەگـەر لەسـەر جێگەیـەك پیـساییکرد ژنەکـــەی تەلاَقـــدەدات یـــاخود نەخۆشییەکی درێژخایان دەگریٚ.

*ئەگـــەر کەوتـــە نێـــو پیـــساییەوە دەکەوێتە نێو غەم‌و پەژارەوە ، ئەگـەر لەشـوێنێکی تـەنگ گیربـوو زینـدانی دەکریٚ.

*ئەگەر پیساییکرد بەخۆیدا دەکەوێتە هەڵەوە یان ملکەچی‌و رسوایی یاخود وتەی ناقۆلاو خراپ.

*ئەگەر پیساییکرد بەخۆیدا دەکەوێتە هەڵەوە یان ملکەچی‌و رسوایی یاخود وتەی ناقۆلاو خراپ.

*پیـــسایی خواردنێکـــە خراپبـــووەو بۆگەنیکردووە.

*هاتنـەدەرەوەی پیـسایی قوتاربوونـە لـەگوناهو تـاوان، هـەروەها هاتنـە دەرەوەی پیـسایی بەلَگەیـە لەسـەر رۆیشتنی میوان.

*پیسایی لەخەودا بەلَگەیە لەسەر ماڵی پیـاو یـان نهێنـی کـەلای کـەس باسیناکات.

*دەگونجێت پیسایی بەلَگەبێت لەسـەر سـەفەرو خوداوەنـد دەفـەرموێت: ﴿أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ﴾ (النساء: ٤٣).

*پیسایی بەلَگەیە لەسەر:

+ زۆرانبازی.

+بەجێهێنانی پێداویستی.

+رەواندنەوەی نەخۆشی ناوەکی.

+وەسوەسـەو گەرانـەوەی ئەمانـەت‌و کۆتایی داواخوازی.

*ئەگەر بۆنیهات یاخود جل‌وبەرگەکەی پیسکرد یان بەزۆر هاتەدەروە بەلَگەیـە لەسەر غەوم پەژارەو ئارەزووی پـیس‌و گەندەڵ‌و زۆرلێکردن‌و زیان‌و لەباربردنی منداڵ.

*دەرووی خێـــرە بـــۆ ئـــەوەی لەنارەحەتیدایە.

*ئەگـەر پیـسایی مرۆڤـی بەرکـەوت تووشی زیناو داوێنپیسی دەبێت.

*ئەگـەر بینـی پیـساییەکەی زۆربـوەو لەسەر سەفەربوو سەفەر ناکات چونکە جەردە رووتێدەکات.

*خـواردنی پیـسایی هێنـانی مـاڵێکی حەرامە لەگەڵ پەشیمانی.

*دەگونجێـــت لەقـــسەو وتـــە پاشـــگەزببێتەوە بـــەهۆی بـــوونی خوێنەوە.

*ئەگەر بینی لەسەر زبڵخانەیەکەو چیلکەیەکی بەدەستەوەیەو بڵاویدەکاتەوە کاروباری دادگا دەگرێتە دەستو بەماڵو سامانی خەڵکی تاقیدەکرێتەوە.

*ئەگەر لەسەر خوانو سفرەیەك پیساییکرد ماڵێکی بەتامو چێژ دەکرێ یان دەچێتە لای هاوسەرەکەی.

*ئەگەر پیسایی لەجلەکانیداکرد یاخود دەفرێکدا ماڵو سامانی لەبەکرێگرتنی خزمەتکاردا خەرجدەکات.

*ئەگەر بینی پیساییکرد لەژێر خۆیدا دەورووبەری هەستی پێناکەن.

*ئەگەر بینی پیسایی کۆدەکاتەوەو توندبوو یا شل ئەگەر خاوەنی کێڵگەوبێستانو ماڵو سامان بێت بەروبوومی لەبێستانو کێڵگەکەی کۆدەکاتەوە ، ئەگەر هەژاربوو ماڵو سامان لەخێردا کۆدەکاتەوەو خۆشی دەوڵەمەندە ،بۆ پارە گۆڕەرەوە بەڵگەیە لەسەر خستنگەڕی پارە بەسوود.

*ئەگەر لەدەشتێکدا پیساییکردو باڵندەو گیاندارانی زەوی کۆیانکردەوە ئەگەر لەسەفەردابوو ڕێگەی لێدەگیرێو دزەکان ماڵو سامانی دەبەن.

*ئەگەر پیساییەکی زۆریکرد لەلێشاو دەچوو غەمو پەژارەو ترسان لەدەستەڵاتدار رووی تێدەکات.

*ئەگەر پیساییەکە گەرمبوو نەخۆشییەکی سەخت دەگرێ پاشان قوتاردەبێ یان تومەتێکی بۆدروستدەکرێو خۆی لەبەرگی دزدا دەبینێتەوە.

*ئەگەر پیساییەکەی کرمێکی زۆربوو لەماردەچوو منداڵی زۆر دەبێتو دوژمنایەتی دەکەن.

**پیسی**: (ئیبن سیرین): ئەوەی ببینێ پیسبووە دووزامی لێ دیاریدەدات.

**پیسیو چڵکنی**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ئەگەر مرۆڤ بینی لەجلوبەرگو لەشو لارو قژدا غەمو پەژارەیە بۆ خاوەنەکەی.

*جلوبەرگی پیس گوناهو تاوانە، ئەگەر بینی خرایەپاڵ ئاین تێکچوونی ئاینی خاوەنەکەیەتی بەئەندازەی پیسییەکە.

*ئەگەر چەوری پێوەبوو تێکچوونی دنیایە.

*ئەگەر بینی جلوبەرگی بەهۆی پیسییەوە شتو پاشان پاکیکردەوە تەوبە دەکاتو لەگوناهەکانی پاکدەبێتەوە.

*جلوبەرگی پیس‌و چڵکن بۆ مردوو تێکچوونی ئاین‌و دنیایەتی.

*شتنی گوێچکە نەخۆشییە ، ئەگەر بینی چڵک‌و پیسی گوێچکەکانی پاکدەکاتەوە وتەیەکدەکات‌و مژدەی پێدەگات.

*ئەگەر چڵک‌و پیسی گوێچکەی خوارد کاری نێربازی ئەنجامدەدات‌و دەکەوێتە کارێکەوە خەشم‌و قینێکی گەورە رووی تێدەکات چونکە چڵکی گوێچکە تاڵە هەموو شتێکی تاڵ باش نییە مەگەر چارەسەربێت.

*ئەگەر مرۆڤ چڵکی گوێچکەی بەزۆری بینی بەڵگەیە لەسەر وتەی خراپ کەپێیدەگات ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆ قایمکردن لەبەرانبەر دوژمنان یان داخستنی دەرگای شەڕ ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر گوێچکەی کەڕ نەبێت ئەگەر گوێچکەی کەڕبوو بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارەو نەخۆشی.

**پیسی‌و گەندەڵی:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا پیسی پێوەیەو ئەمانەتی لادانرابوو یاخود شایەنبوو یا قەرزاربوو گوناهبارە ، ئەگەر ئەو پیسییەی شت لەو بارە قوتاردەبێ، ئەگەر دەستنوێژی نەگرت بەڵام چوە سەرئاوو پیساییەکەی شت لەگوناهو تاوان دەچێتە دەرەوە یاخود قەرزەکەی لەلا دەمێنێتەوەو هەوڵی دانەوەیدەدات.

**پینەچی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کەسێکە بەهانە دەهێنێتەوە بۆ کارێك بەهانە هەڵناگری‌و خاوەن ناکۆکییە ، ئەگەر عەورەتی ژنی داپۆشی دوای دەرکەوتنی کاری داوێنپیسدەداتە پاڵی پاشان داوای لێبوردنی لێدەکات کاتێ راستی بۆدەردەکەوێ.

*ئەگەر پینەی جلوبەرگی خۆیکرد ناکۆکی دەکەوێتە نێوان خۆی‌و هاورێیەکی هیچ خێرێکی تێدا نییە.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر چاکسازی‌و چاکەو چاکبوونەوە لەنەخۆشی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆپڕچەککردن‌و بارانبارین.

*هەروەها وتراوە: پینەکردن پاشگەزبوونەوەیە لەگوناهو تاوان، یان بەهانەی پووچ‌و بەتاڵە.

**پینەی قوماشی کۆن:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر مەرایی‌و باشی حاڵ. دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر هەژاری بەردەوام.

## پ ێ

**پێ(قاچ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا جوانی ماڵو داراییە لەگەڵ جێگیربوونی کردارەکانی‌و پشت‌وکۆڵەکەی کارەکانییەتی، پەنجەکانیشی کچی خەوبینەرە لەگەڵ بەردەست‌و خزمەتکارەکانی، ئێسکەکانی ماڵو سامانە کەبژێوی لەسەریەتی‌و پشتی پێدەبەستێ.

*ئەگەر قاچێکی روو بەئاسمان بەرزبوەوە دەمرێ، مووی هەردووقاچ قەرزێکە بەسەریا تێپەریوە.

*هەردوو قاچ بەڵگەیە لەسەر ئاژەڵو ماڵوداراییی .

*ئەگەر بینی قاچەکانی برا ئاژەڵەکەی‌و ئوتومبیلەکەی تیادەچی‌و ماڵو داراییی بەفیڕۆدەڕوات.

*ئەگەر بینی قاچی زیادەی هەیە بژێوی زیاددەکات.

*جوانی قاچ بەڵگەیە لەسەر باشی خەوبینەر لەدنیاو قیامەتدا، ئەگەر قاچی مردوو باشبوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەبەهەشتدایە، ئەگەر سەرپێچیکارێك بینی قاچەکانی جوانە بەڵگەیە لەسەر تەوبە، بۆبێباوەڕ بەڵگەیە لەسەر موسوڵمانبوونی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چوونە پێش لەکارو بارەکانی‌و چارەنووسی باشی لەوەی رووی تێدەکات.

*دەگونجێت باشی قاچ بەڵگەبێت لەسەر بەجێهێنانی نوێژ یاخود ئەوەی پشتگیریدەکات لەبەرپرس‌و باوك‌و دایك یان ئاژەڵ یاخود ئوتومبیل یاپیشەو ماڵو داراییی.

**پێپەتی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی بەپێی پەتی دەڕوات بەڕێوە بەڵگەیە لەسەر باشی ئاینی‌و رەواندنەوەی غەم‌و پەژارەی.

*هەروەها وتراوە: خەوێکی لەوچەشنە بەڵگەیە لەسەر بەڵاو نەهامەتی لەلایەن ژنەوەو تەڵاقدان.

(نابلسی)دەڵێت: پێپەتیبوون لەخەودا ماندووبوونە ئەگەر نەبینێت نەعلەکانی داکەندوە بەڵام ئەگەر بینی بە پێیی پەتی دەڕوات بەڕێوە دەستەڵات‌و فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت.

**پێچانەوە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ئەندامەکان‌و شاردنەوەو داپۆشینی وتە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا لێخۆشبوونە لەگەڵ خەشم‌و قینگرتن یان بەسەرچوونی رزق‌و رۆزی‌و چارەنووس.

**پێچراو:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: لێپێچراو سەفەرو گەشت وگوزارە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ماڵوسامانە بەمەرجێك نەپێچرێ.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژیو چەمانەوە.

**پێچکە:** (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی ببینێ پێچکە دەخواتو مۆخەکەی دەمژێ ماڵی هەتیو دەخوات.

*هەروەها ئەوەی پێچکە دەخوات وەك ئەوە وایە ماڵی خەڵکی بەرێزو شەریف بخوات چونکە پێچکەو مەڕ باشترین ماڵی خەڵکییە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵی هەتیوە، ئەگەر بینی پێچکەکەی مژی ماڵی هەتیو دەخوات.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی پێچکە بخوات ماڵو سامانی خەڵکی بەرێزدەخوات چونکە مەڕ بەرێزترین ئاژەڵە.

**پێچەر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: نەخۆشیو دینارە، ئەوەی پێچەرێك بدۆزێتەوە یان هەڵبگرێ ژنەکەی نەخۆشدەکەوێو دیناروپارەی زۆر خەرجدەکات.

**پێست:** (نابلسی)دەڵێت: پێست پەردەی مرۆڤەو میراتییە لەدوای خۆیی یان لەکاتی ژیانیدا بەجێی دەهێڵێ.

*ئەگەربینی وەك مەڕ پێستی دادەماڵن ئەگەر نەخۆشبێت بەڵگەیە لەسەر مردنی ، ئەگەر لەشاساغیش هەژار دەکەوێتو ئابرووی دەچێت.

*هێزو پتەوی لاشەش بەهێزی باوەڕو ئیمانە.

*ئەگەر لەشولاریبوبوو بەلەشولاری مارێك دژایەتیو رکەبەرایەتی دەردەخات.

*ئەگەربینی دووگی هەیە وەك بەران کورێکی دەبێت بژێوی بۆ پەیدا دەکات.

*ئەگەربینی لەشولاری بوە بەئاسن یان گڵێنە بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*ئەگەر زیادەیەکی بەلەشولاری خۆیەوە بینیو هیچ زیانێکی نەبوو بۆی رژانی نیعمەتە بەسەریا.

*لەشولاری مرۆڤ لەخەودا بەڵگەیە لەسەرئەوەی مرۆڤ دادەپۆشێتو خۆی پێ پۆشتەدەکاتەوە وەك جلوبەرگو هاوسەرو لانەو ماڵو کوڕ، یاخود ئەوەی پەنای پێدەدات وەك دەستەڵاتدارو فەرمانڕەواو گەورەو بەرپرس، بەهێزیو جوانیو قەشەنگی

بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵو گوزەرانی، لاوازیو دەنگگۆڕانو بۆگەنکردنی بەڵگەیە لەسەر خراپی حاڵوباری.

*پێست وەك قەڵغان وایە بۆ مرۆڤو شتیتر، بۆ مرۆڤ بریتییە لەباوكو دایكو دەستەڵات ماڵودارایيو جلوبەرگو هاوسەرو زەویو لەشساغيو نەخۆشيو ئیمانو هاوەڵ پەیداكردن.

*دەگونجێت پێست بۆ مرۆڤ بەڵگەبێت لەسەر هاوڕێو دوژمنی گەواهیدەر لەرۆژی قیامەتدا لەسەر خاوەنەكەی.

*دەگونجێت پێست بەڵگەبێت لەسەر ئارامگرتنو بەهێزیو خۆڕاگری لەكاروباردا، ئەگەر بینی پێستی باشبوە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خێرو پشوودانو چاكبوونەوە لەنەخۆشی، ئەگەر مردوبوو رەنگی پێستەكەی بەجوانی بینرا لەخەودا بەڵگەیە لەسەرئەوەی لەخۆشیەكانی بەهەشتدایە، ئەگەر بەناشیرینی بینی یا بەرەشی بەڵگەیەلەسەر ئەوەی لەسزاو خەشمدایەو، رەشهەڵگەڕانیشی لەخەودا وازهێنانە لەئاین.

*ئەگەر كوڕێكی رەشیان بەخەڵاتدایە بارێك خەڵۆزی دەدەنیّ.

*ئەگەر ژنی رەش پێست ببینيّو چاودێری بكەن خێری پێیدەگاتو بەرێزو پیرۆز دەبێت.

*پێستی سوور لەخەودا دەروولێكردنەوەو شكۆمەندییە هەروەها دەڵێن: ئەگە لەگەڵ سووریدا سپێتی تێكەڵبوو خاوەنەكەی شكۆمەندی بەدەستدەهێنێت.

*زەردبوونی رەنگیش نەخۆشییە.

*ئەوەی خۆی ەنگی پێستی رەشبێتو لەخەودا بەسپێتی بینرا ئەوە لاوازيو ناڕەحەتيو ملكەچی رووی تێدەكات.

*ئەگەر لەشو لارو دەمو چاوی بەسوور هەڵگەڕان غەموپەژارەی درێژە دەكێشیّ.

*ئەوەی لەشولاری خۆی ببینيّ بوە بەئاسن یاخود بەرد ئەوە بەو چەشنە دەبێتو پێستی سەرجەم ئاوەڵان.

*هەروەها دەڵێن: پێست لانەو ماڵە ئەگەربوو ئەگەر بوو بەخاوەنی ئەگەر پادشا یا فەرمانڕەوا پێستی خەڵكی داماڵی ستەمیان لێدەكاتو ماڵو داراییان دەبات.

*پێست داماڵینی زاناو وازهێنانو لەبیرچوونی زانیارییە.

*ئەگەر پێستی شاعیرێك دابماڵێت كراسەكەی دادەكەنێت كاتيّ دەچێتە نێو حەمام، یان پۆشاكێكی لێدەدزریّ.

*ئەگەر ژنێكی رەشپێست بینی پێستی دادەماڵریّ خۆرهەڵهاتنە دوای شەوێكی تاریكو نووتەك.

**پێشبڕكێ**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیەلەسەر جموجووڵو بێكاری یان سەفەری بێكەڵكو سوود.

*ئەگەر خەوبینەر نەخۆشبوو دەمرێو، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێ یان كەسێكی ئاوارەبوو لەسەفەر دەگەڕێتەوە.

*پێشبڕكێی ئاژەڵان ئەنجامدانی كاری یاساغو لەخۆبایبوون و زامنكردنێكە سەلامەتی بەمەرج نەگیراوە یان مردنیەتی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر فیتنە لەنێوان خەڵكیداو پەرتەوازەكردنیان.

*پێشبڕكێ بەكۆتر بەڵگەیە لەسەر نێربازی یان ئالوودەبوونی تێكەڵبوونیان.

**پێشەكی ( پێشەنگ )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: خزمەتكارە.

**پێشی مەلاشوو**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر پیاو، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی ژنو كوڕەكەی تێدا كۆكن لەسەری.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خزمەتكار.

(نابلسی)دەڵێت : خزمەتكارێكە نهێنی دەزانێتو لەخەڵكی دەشارێتەوەو خاوەن ڕێزە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرنەوەی نهێنی خۆی بۆ باسدەكات وەك باوكو دایك.

**پێغەمبەر(ﷺ)**: (ئەبوهورەیرە) ــ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: گوێم لێبوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەوەی لەخەودا بمبینێ وەك بینینم وایە لەحاڵی بێداریدا، چونكە شەیتان ناتوانێ بچێتەسەر شێوەی من"[1].

*(ئەبوسەعد) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: "ئەوەی من لەخەودا ببینێ ڕاستی بەدیكردووم"[2].

*(ئەنەس)ی كوڕی (مالك) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "ئەوەی من لەخەودا ببینێ ناچێتە دۆزەخەوە"[3].

*(ئەبوسەعد)(ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: "خوداوەند پێغەمبەری خوای

[1] (بوخاری) فەرموودەی ژمارە(٦٩٩٣) ، و(مسلم) (١٧٧٥/٧/٤) لەرێگەی (ئیبن ئیسحاق)ەوە.

[2] (بوخاری) (٦٩٩٦) و(مسلم) (١٧٧٦/١١/٤).

[3] (ئیبن عدی) لە(الكامل للضعفاء)دا (٣٨٨/٣) هێناویەتیو (ئیسناد)ەكەی (لاوازە).

وەك بەزەیی و سۆزێك بۆ جیهان ڕەوانەكردوە ، خۆشحاڵی بۆئەوەی لەحاڵی ژیانیدا بەدیكردو شوێنیكەوت ، خۆشحاڵیش بۆ ئەوەی لەخەودا دەیبینێ چونكە ئەگەر قەرزارێك ببینێ قەرزەكەی دەداتەوە.

*ئەگەر نەخۆشێك ببینێ خوداوەند شیفاو چارەسەریدەدات.

*ئەگەر جەنگاوەرێك بەدیبكات سەركەوتوو دەبێت.

*ئەگەر ڕەبەنێك ببینێ (حەج)دەكات.

*ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ)لەزەوی و خاكێكی وشكدا بەدیبكرێت ئەو زەوی و خاكە فەڕوپیتدار دەبێ، یان لەشوێنێكدا ببینرێ ستەم و زۆرداری تێدا بڵاوبێت دادپەروەری لەو شوێنەدا بڵاودەبێتەوە لەگەڵ دڵنیایی ، ئەمەش لەكاتێكدا لەسەرشێوەی خۆی بەدیبكرێ، ئەگەر ڕووخساری گۆڕاو لاوازبوو یان هەندێك لەئەندامەكانی نەبوو بەڵگەیە لەسەر سستی ئاین لەوشوێنەو دەركەوتنی بیدعە.

*هەروەها ئەگەر بەجل وبەرگی دڕاوەوە بینرا بەهەمان شێوەیە.

*ئەگەر بینی لەخۆشەویستیدا خوێنەكەی خواردەوە بەنهێنی لەجیهادو تێكۆشاندا شەهیددەكرێ.

*ئەگەر بینی نەخۆشەو بێداربوەوە لەنەخۆشی خەڵكی ئەو شوێنە دوای تێكچوون چاكدەبنەوە.

*ئەگەر پێغەمبەری(ﷺ)بەسواری بینی سەردانی گۆڕەكەی دەكات بەسواری، ئەگەر بەپیادە بینی بەپێ سەردانی گۆڕەكی دەكات، ئەگەر بینی بەڕێكی سەردانیدەكات لەسەركاروبارەكانی جێگیردەبێت و فەرمان بەپێشەوای سەردەمی خۆیدەكات.

*ئەگەربینی نانەدەخوات لەگەڵی بڕیارەو بەسەریا دەدات زەكاتی ماڵەكەی بدات.

*ئەگەربینی پێغەمبەر(ﷺ)مرد لەڕەچەڵەكی خۆی كەسێكدەمرێ.

*ئەگەر تەرمەكەی لەشوێنێكدا بینی لەوشوێنەدا بەڵاو نەهامەتیەكی گەورە ڕوودەدات.

*ئەگەربینی تەرمەكەی هەتا گۆڕستان برا حەز لەبیدعە دەكات.

*ئەگەربینی سەردانی گۆڕەكەیكرد ماڵ و سامانێكی بێشومارو مەزن بەدەستدەهێنێ.

*ئەگــــەربینی بـــــوە بـــــەکوڕی پێغەمبــەر(ﷺ)و لەرەچــەڵەکی ئــەویش نییە خەونەکەی بەڵگەیـە لەسـەر پـاکی باوەڕەکەی.

*ئەگـــــەربینی بــــوە بـــــەباوکی پێغەمبەر(ﷺ)بەڵگەیە لەسـەر سستی‌و لاوازی باوەڕو دڵنیایی.

*بینینی پێغەمبەر(ﷺ)لەخەودا بەتەنیا پەیوەنــدی بــــەوەوە نییـــە بــــەڵکو پەیوەنــدی بەســـــەرجەم کۆمــــەڵی موسوڵمانانەوەهەیە.

*دەگێڕنەوە(ئوم فەزڵ)ـ رەزای خـوای لێبێـت ـ بەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ) وتـی: لەخەودا بینیم هەندێك لەلاشـەت بڕابوو ئەو بەشە بڕاوانـەم لەژوورەکـەی خـۆم دانـا، ئـەویش فـەرمووی: "خەونەکـەت خێـرەو فاتمـە پـشت بـەخوا کـوڕێکی دەبێـت‌و لـەماڵی تـۆ دەبێـت"[1] ئنجـا (حسێن) لەدایکبوو ئەو گۆشیکرد.

*ئەگەر پێغەمبەری بینـی (ﷺ)شـتێکی باشـــی دنیـــای دایـــە لـــەخواردن‌و خواردنــــەوە خێرێکــــە بەئەندازەیــــەك بەدەستیدەهێنێ.

*ئەگــەر ئــەوەی دایــە لەناوەڕۆکـدا خراپبـــــوو وەك کاڵـــــەك‌و شـــتیتر لەڕووداوێکی مەزن قوتار دەبێ مەگەر خراپەو ماندوبوون رووی تێبکات.

*ئەگـەر بینـی یـەکێك لەئەندامـەکانی پێغەمبـــەر(ﷺ)لـــەلای خەوبینـــەرەوە بەدەستیهێناوە بەڵگەیە لەسـەر بیدعـە دروســـتکردن لەشـــەرعداو وازهێنــــان لەوانیتر.

*(ئیبن ئەبی تەیب)دەڵێت: دەساڵبوو تووشی کەڕی بوبووم، رووومکردە شاری (مەدینـە)و لـەنێوان گـۆڕی پێغەمبـەرو دوانگەکەیـــدا مامـــەوە خـــەومبینی بەپێغەمبەرەوەو وتم: ئـەی پێغەمبـەری خوا(ﷺ)تۆ پێت وتم ئـەوەی داوای ئـەو شوێنە بکات بۆم لەخودا من شەفاعەتی بۆدەکـەم، فـەرمووی: خواچارەسـەرت بدا مـن بـەو شـێوەیەم نـەوتوە، بـەڵکو وتومـــە:"ئـــەوەی داوای (وســـیلە)م بۆبکـات شـــەفاعەتی مـن بەپێویـست دەگـــەڕێ بـــۆی"وتـــی: گوێـــچکەم بەفــەرووپیتی دوعــای پێغەمبــەر(ﷺ) چاکبوەوە.

*یەکێکی دی دەڵـێ: هـەژاربووم‌و هـاتم بۆ زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرو سڵاومکرد لـەخۆی‌و هـەردوو هاوەڵەکـەی ، ئنجـا وتم: ئـەی پێغەمبـەر هـەژارم‌و لـەلای

---

[1] (ئـیبن ماجـە) لـە(کتـاب التعـبیر) (٣٩٢٣)و (ئەحمـــەد) لـــە(مـــسند)دا (٢٦٧٢) و(حـــاکم) لە(مستدرك) (٣/١٧٦).

تۆش میوانم ، پاشان دوورکەوتمەوەو نوستم بەدوور لەگۆڕەکە ، پێغەمبەر (ﷺ)هات بۆلام و هەستام و نانێکی پێدام و هەندێکم خواردو کاتێ بەئاگاهاتم هەندێکیتری لەدەستمدامابوو.

* لە(ئەبی وەفا)ی (قاریهەرەوی)یەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: پێغەمبەرم بینی(ﷺ)لەخەودا لە(فرغانە) هەروەها لەساڵی سێسەدو شەست ساڵ و لەلای دەستەلاتدار دەمخوێند و ئەوانیش گوێیان نەدەگرت و قسەیاندەکرد، بەغەم و پەژارەوە رووم کردەوە ماڵ ونوستم، پێغەمبەرم بینی(ﷺ)رەنگی گۆڕابوو، پێی وتم: قورئان لای کۆمەڵێك دەخوێنیتەوە قسەدەکەن و گوێناگرن ، چیتر مەخوێنە مەگەر خوا ویستی لێبێ، کاتێ بەئاگاهاتم چوار مانگ زوبانی خۆمم گرت، هەر پێداویستیەکم هەبوایە دەمنووسی لەسەر رووپایەك، فەرموودەگێڕەوان و خاوەن راوبۆچوون هاتن بۆلام و فتوایان بۆدام قسەبکەم ، چونکە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: مەگەر خودا ویستی لەسەربێ.دوای ئەو چوار مانگە نووستم لەوشوێنەدا کەواپێشتر تیایدا نوستبووم پێغەمبەرم بینی(ﷺ) رووخساری گەش و روونبوو ، پێی وتم: تەوبەتکرد ، وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: ئەوەی تەوبە بکات خوداوەند تەوبەی لێقبوڵ دەکات، پاشان زوبانی پێدەرهێنام و دەستی هێنابەسەریاو فەرمووی: مەیخوێنە هەتا گوێبیستی دەبن ، کاتێ لەخەوهەستام زمانم بەربوو پشت بەخوای گەورە.

* دەگێڕنەوە پیاوێکی دەوڵەمەند نەخۆشدەکەوێ و لەخەودا پێغەمبەر(ﷺ) دەبینێ و پێی دەفەرموێ: ئەگەر ویستت چاکبیتەوە لەنەخۆشیەکەت ناونا وەربگرە، کاتێ بەئاگاهات دەهەزار درهەمی نارد بۆ (سوفیان)ی (سەوری)هەتا بیدات بەهەژاران و پاشان راڤەولێکدانەوەی خەوەکەی لێپرسی ئەویش وتی: ناونا زەیتونە چونکە خوداوەند دەفەرموێ: ﴿لاَ شَرْقِيَّةٍ وَلاَ غَرْبِيَّةٍ﴾ (النور:٣٥).ئنجا بەزەیتون چارەسەری وەرگرت خوداوەند چاکیکردەوەو فەرپیتی بەکارهێنانی بۆ بەگەڕخستو گرنگی فەرمانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بەدەرکەوت.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) لەخەوداو خراپی حاڵوباری لا باسدەكات، ئەویش پێی دەڵێت: بچۆ بۆلای (عەلی)ی كوڕی (عیسی) پێی بڵێ ئەوەندت بداتێ كەحاڵی خۆتی پێباش بكەی. ئنجا پرسی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ)بەچ نیشانەیەك بچم بۆلای؟ فەرمووی: بڵێ بەونیشانەیەی تۆمنت لە(البطحاء) بینیوەو ومن لەشوێنێكی بەرزبوومو دابەزیو هات بۆلام، پێموت: بگەڕێرەوە بۆ شوێنی خۆت، لەوكاتەدا لەدەستەڵات لابرابوو ئەوەبوو گەڕایەوە بۆ پۆستی پێشووی. كاتێ بەئاگا هات چوو بۆلای (عەلی)ی كوڕی (عیسی)و لەوڕۆژەدا وەزیربوو چیرۆكەكەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش چوارسەد دیناری دایەو وتی: قەرزی خۆتی پێبدەرەوە، هەروەها چوارسەد دیناری تری دایەو وتی: ئەمەش بكەبەسەرمایەی خۆتو كاتێ خەرجتكرد بگەڕێرەوە بۆلام.

*پیاوێكی چادرفرۆش دەڵێت: چادرێكم فرۆشت بەهەندێك لەدەستەلأتدارانی ئەهوازو بۆپارەكەی رووەمتێكردەوەو جنێویدایە (ئەبوبەكر)و (عومەر) (رەزای خوای لێبێت) بەهۆی شێوەیەوە وەلأمم نەدایەوە بەغەمو پەژارەوە گەڕامەوە بۆماڵو ئەوشەوە پێغەمبەرم(ﷺ) لەخەودا بینی پێمگوت: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) فلأنەكەس جنێوی بە(ئەبوبەكر)و (عومەر) داوە ئەویش فەرمووی: بیهێنە بۆم، منیش هێنامو فەرمووی: بیدە بەزەویدا فەرمانەكەم بەجێهێناو فەرمووی: سەریبڕە، سەربڕین زۆر قورسو گرانبوو لەلامو وتم: ئەی پێغەمبەر سەریببڕم، فەرمووی: بەڵێ سێجار ئەو فەرمانەی پێدام، چەقۆكەم پیاهێناو سەرمبڕی، كاتێ رۆژبووەوە وتم: دەچم بۆلایو ئەو خەونەی بۆ دەگێڕمەوە، كاتێ چووم بۆ لایو گەیشتمە بەر ماڵەكەی گوێم لەدەنگی شیوەنو گریانبوو پاشان وتیان مردوە.

*پیاوێك هات بۆلای (ئیبن سیرین)ووتی: دوێنێ شەو لەخەودا بینیم قاچم خستەسەر رووی پێغەمبەر(ﷺ)، (ئیبن سیرین) پێی وت: دوێنێ شەو بەسۆڵەكانتەوە خەوتی؟ وتی: بەڵێ، ئەویش وتی: دایبكەنە، كاتێ دایكەند لەژێر قاچێكیدا درهەمێك هەبوو لەسەری نوسرابوو (محەمەد)پێغەمبەری خوا(ﷺ).

(نابلسی)دەڵێت: لەفەرموودەیەكی (صحیح) داهاتووە پێغەمبەر(ﷺ)

فەرموویەتی: "ئەوەی لەخەودا بەدیم بکات لەکاتی بێداریدا دەمبینێ چونکە شەیتان ناتوانێ بچێتەسەر شێوازی من"[1].

*هەروەها لە(روایة)ێکدا دەفەرموێت: "ئەوەی من ببینێ حەقی بینیوە"[2].

*چەندین فەرموودەی دیکە لەو بارەیەوە هاتووەو زانایان جیاوازی هەیە لەبارەیانەوەو هەندێکدەڵێن: شوێنی ئەمە ئەوەیە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) لەسەرشێوەی خۆی ببینێو هەندێکیتر دەڵێن: لەسەر ئەو شێوەیەی کەروحی کێشراو گەڕایەوە بۆلای خواو لەوانەی خاوەنی ئەم رایەن (ئیبن سیرین) (رەحمەتی خوای لێبێت).

*هەندێکیتر دەڵێن: بینینی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر سیفەتو شێوەی خۆی زانینی راستییە چونکە بینینی زاتی پاکو بێگەرد ناسینی راستییە.

*ئەگەربینی پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای ئەوا بۆ خەوبینەر باشە.

*بینینی پێغەمبەر(ﷺ)لەهەر حاڵوبارێکدا راستەو خەوی تێکەڵو پێکەڵ نییە.

*هەروەها هەندێك لەراڤەکارانی خەو دەڵێت: ئەگەر بەپیری پێغەمبەری(ﷺ) ببینێ مەبەستی ئاشتییە، ئەگەر بزەوخەندەی لەسەر لێوەکانی بینی دەستیگرتوە بەسوننەتی پێغەمبەر(ﷺ).

*هەندێکیتر دەڵێن: ئەوەی لەسەر شێوەی خۆی ببینێ بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵوباریو بالأیی شانو شەوکەتو زاڵبوون بەسەر دوژمنانیدا.

*ئەگەربینی حاڵوباری گۆڕاوەو رووخساری گرژە بەڵگەیە لەسەر خراپی حاڵی.

(ئیبن ئەبی جەمرە)دەڵێ: بینینی پێغەمبەر(ﷺ) لەشێوەیەکی جواندا باشی ئاینی خەوبینەرەو کەموکوڕی لەجەستەولاری حەزرەتدا یان گۆڕانی خراپی ئاینی خاوەنەکەیەتی چونکە پێغەمبەر(ﷺ) وەك ئاوێتەیەکی پاکو بێگەرد وایە ، ئەو سوودەش لەبینینی پێغەمبەر(ﷺ) وەردەگیرێ چونکە لەباشترین حاڵدایەو (ئیبن حەجەری هەیتەمی) لە(شمائل الترمذي) دا باسیکردوە لەگەڵ سەرجەم پێغەمبەران بەو چەشنەنو شەیتان ناتوانێ خۆی بەخوداو نیشانەو پێغەمبەرانو فریشتەکان بچوێنێ.

---

[1] (بوخاری)ژمارەی فەرموودە(٦٩٩٣)و (مسلم) (١٧٧٥/١١/٤).

[2] تەخریجکراوە.

*ئەگەر پێغەمبەری (ﷺ) بەدیکر حاڵو باری ئاساندەبێو ئەگەر غەمباربوو دەرووی لێدەکرێتەوەو، زینـدانیبوو ئازاد دەکرێ لەزیندان.

*ئەگەر لەشوێنێکدا بینرا ئابلۆقە درابوو یان گرانیو بەرزی نرخ لەئارادابوو دەروویان لێدەکرێتەوەو نرخەکانیان هەرزاندەبێ، ئەگەر ستەمیان لێکرابوو سەردەکەون یان ترسابوون دڵنیا دەبن.

*ئەگەر پێغەمبەری(ﷺ) لەسەر ئەو سیفەتانەی بینی کەلەسوننەتدا هاتوە مژدەیە بۆ خەوبینەرو چارەنووسی لەئاینو دنیادا باشدەبێ.

*ئەگەر رووی تێکرد یان مامۆستاییبوو یاخود وابەستەیبوو لەنوێژدا یان لەرێگەیەکدا، یاخود شتێکی باشی پێدا، یان جلوبەرگێکی شیاوی دایە یان بەڵێنی پێدا یاخود دوعاو نزای بۆکرد بەخێر ئەگەر خەوبینەر شایستەبوو بۆ وەرگرتنی دەستەڵات وەریدەگرێو لەسەردەمی خۆیدا دادپەروەردەبێو فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە دەکات.

*ئەگەر زانابوو کار بەوزانیارییە دەکات کەهەیەتی ، ئەگەر خواناسبوو دەگات بەپلەوپایەی کەرامەتداران، ئەگەر سەرپێچیکاربوو تەوبەدەکاتو دەگەڕێتەوە بۆلای خودا ، ئەگەر بێباوەڕبوو رێنومایی دەکرێو دەگونجێت رێگەی زانیاریو ئاوەدانکردنەوەی دڵودەروون بگرێتەبەر بەپێی ئایەتی: ﴿فَآمِنُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ﴾ (الاعراف:١٥٨).

*ئەگەر خەوبینەر ترسابوو لەدەستەلاتدار شەفاعەتکارێکی وتە پەسەندو وەرگیراو دەبێ، ئەگەر خەوبینەر لەسەر بیدعە کۆببوبوەوە با لەخوابترسێ بەتایبەت ئەگەربینی پشتی تێکرد.

*دەگونجێت مژدەیەکی دڵخۆشکەر رووی تێبکات.

*هەروەها بینینی بەڵگەیەلەسەر بەدەرخستنی بەڵگەو راستگۆییو بەجێهێنانی بەڵێنو پەیمان.

*دەگونجێت دوژمنایەتیان لێوە رووبدات لەگەڵ حەسوودیو رقوقین.

*دەگونجێت لەخانەوادەکەی ببڕێو بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی.

*دەگونجێت باوکو دایکی بمرن.

*هەروەها بینینی بەڵگەیەلەسەر دەرخستنی کەرامات چونکە ئاسك سەلامی لەپێغەمبەر(ﷺ)کردوەو

ئاژەڵیش قاچەکانی ماچکردوەو بەرەو ئاسمان بەرزکراوەتەوەو دارو درەخت گوێبیستی بوون.

*ئەگەر خەوبینەر لەوانەبوون کەچارەسەری چاویاندەکرد لەپیشەکەیدا دەگات بەئاستێك هیچکەس پێی نەگەیشتبێ چونکە پێغەمبەر (ﷺ) چاوی (قتادة)ی گەڕاندەوە.

*ئەگەر خەوبینەر لەسەفەردابوو، خەڵکیش تینوبوون بەڵگەیە لەسەر باران بارین‌و داهاتنی بەزەیی چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لەمابەینی پەنجەکانی ئاو هاتە دەرەوە لەکاتی نەبوونی ئاودا، هەروەها ئەگەر خەڵکی لەنەبوونی‌و قات‌و قڕیدابوون بەڵگەیە لەسەر تێری‌و خۆشی‌و فەڕو بەرەکەت لەلایەکەوە نازانن‌و چاوەڕێ نەبوون.

*ئەگەر ژنێك بینی دەگات بەپلەوپایەیەکی مەزن‌و ناوبانگێکی باش بەدەستدەهێنێ لەگەڵ پاکی‌و ئەمانەتپارێزی لەخۆیدا.

*دەگونجێت تاقیبکرێتەوە بیەوێ‌و وەچەیەکی باشی پێبدرێت، ئەگەر ماڵ‌وساماندارببوو لەگوێڕایەڵی خودایا خەرجیدەکات.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر ئارامگرتن لەسەر ناڕەحەتی.

*ئەگەر بەهەتیوی بینی پلەوپایەیەکی بەرز بەدەستدەهێنێ، هەروەها ئەگەر غەریب‌و ئاوارەبوو.

*ئەگەر خەوبینەر چارەسەری لەش‌ولاری دەکرد خەڵکی سوود لەچارەسەرەکەی وەردەگرن.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر سەرکەوتنی باوەڕداران‌و وێرانی بێباوەڕان بەتایبەت ئەگەر یارانی لەگەڵدابوو.

*ئەگەر بەقەرزاری بینی قەرزەکەی دەداتەوە.

*ئەگەر بەنەخۆشی بینی خوداوەند شیفای دەدات.

*ئەگەر کەسێك کەوا (حەج)ینەکردبوو بینی (حەج)دەکات.

*ئەگەر جەنگاوەرێ بیبینێ سەردەکەوێ.

*ئەگەر کەسێك بینی تاقیکرایەوە خوداوەند دەرووی لێدەکاتەوە.

*ئەگەر لەزەوییەکی وشکدا بینرا فەڕو پیتدار دەبێ.

*ئەگەر کەسێك بینی دەنگی هەڵبزڕکابوو یان ئەندامەکانی کەم‌و کوڕییان تێدابوو بەڵگەیە لەسەر سستی لەئایندا‌و دەرکەوتنی بیدعە

لەوشوێنەدا، بەهەمان چەشنە ئەگەر جڵوبەرگێکی شڕۆڵی لەبەردابینی.

*ئەگەربینی لەخوێنی خواردەوە لەخۆشەویستیدا بەنهێنی لەجیهاددا شەهید دەکرێ، ئەگەر بەئاشکرا خواردیەوە بەڵگەیە لەسەردووڕوویی‌و هاوبەشیدەکات لەزەمی خانەوادەکەی‌و یارمەتی دەدات لەبەشداریکردن لەکوشتاریاندا.

*ئەگەر بەسواری بینی سەردانی گۆڕەکەی دەکات بەسواری‌و ئەگەر بەسوارینەبوو روو لەسەردانیدەکات.

*ئەگەر بینی وەستاوە کاروبارەکانی‌و فرمانی پێشەوای سەردەمی خۆیداکرد.

*ئەگەر بینی مردوە کەسێکی رێزدار لەوەچەی ئەو دەمرێ.

*ئەگەر تەرمەکەی بینی لەوشوێنە بەڵاونەهامەتیەکی گەورە روودەدات.

*ئەگەر تەرمەکەی ئەسپەردەکرد حەز لەبیدعەدەکات.

*ئەگەربینی سەردانی گۆڕەکەی دەکات ماڵ‌و سامانێکی مەزن بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی بوە بەکوڕی پێغەمبەر(ﷺ)و لەرەچەڵەکی ئەونەبوو خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر پاکی ئیمان‌و دڵنیایی.

*ئەگەر پێغەمبەری بینی(ﷺ)و شتێکی پێدا لەخۆشیەکانی دنیا لەخواردن‌و خواردنەوە خێری دەستگیر دەبێ بەئەندازەی ئەوەی کەپێیداوە، ئەگەر ئەوەی کەپێدرا خراپبوو وەك کاڵەك‌و ئەوشتانە لەکارێکی خراپ قوتار دەبێ مەگەر ئێش‌و ئازارو خراپەی پێبگات.

*ئەگەر ئەندامێك لەئەندامەکانی لەلای خەوبینەربوو بەدەستی هێنابوو بیدعەیە لەسەر دەستی ئەودا دروستدەبێت.

*ئەگەر بینی چوە سەر شێوەی پێغەمبەر(ﷺ) یان جلێك لەجلەکانی لەبەرکردوە یاخود ئەموستیلەکەی پێداوە یان شمشێرەکەی ئەگەر خوازیاری دەستەلاتبوو بەدەستی دەهێنێت‌و زەوی ملکەچی دەبێ، ئەگەر لەملکەچی‌و رسواییدا دەژیا خوداوەند شکۆمەندو پایەداری دەکات، ئەگەر قوتابیبوو خواست‌و ویستی بەدەستدەهێنێ، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەنددەبێ، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ.

*ئەگەر پێغەمبەری(ﷺ) لەشوێنێکدا بینی وێرانبوو بەفەڕوبەرەکەتی ئاوەدانیدەکاتەوە، ئەگەر لەنێو

شوێنێکدا بینی دانیشتبوو لەو شوێنەدا بەڵگەو نیشانە دەبێت.

*ئەگەر بینی پێغەمبەر(ﷺ) لەشوێنێکدا بانگدەکات فەڕو پیتو پیاوانی زۆر دەبن.

*ئەگەر بینی بەرنوێژیکرد لەشوێنێکدا کاروباری جیاوازی موسوڵمانان یەکدەگرێتەوە.

*ئەگەر بینی چاوی دەرێژێ دڵنیا دەبێ بەدڵنیایی ئاینو فەرموودەکانی.

*ئەگەر ژنێکی دووگیان یان هاوسەرەکەی بینی منداڵەکەی کوڕ دەبێت.

*ئەگەربینی جوانبوو زیادەی ئاینی خەوبینەرە.

*ئەگەر ریشی پیرۆزی پێغەمبەری(ﷺ) بینی رەشەو هیچ موویەکی سپی تێدا نییە خۆشیو شادیو فەڕپیتێکی مەزن بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر لەشێوەی پیرێکدا بینی بەڵگەیە لەسەر هێزو توانایو زاڵبوونی بەسەر دوژمناندا.

*ئەگەر بەمەزنێکی بێهاوتا بینی لەخەودا پێشەواکەی پلەوپایەو دەستەڵاتی زیاددەکات.

*ئەگەر بینی گەردنی ئەستوور بوە ئیمام ئەمانەتی خەڵکی دەپارێزێ.

*ئەگەر سنگی بەفراوانتر بینی بەرپرسەکەی دەستودڵفراوانە لەبۆسەربازان.

*ئەگەر بینی سکی بەتاڵە گەنجینەکەی خاڵیو بەتاڵدەبێتو هیچ ماڵو سامانێکی تێدانامێنێت.

*ئەگەر پەنجەکانی لای راستی نووسابوویە یەکا بەرپرس رزقو رۆزی نادادتو خەوبینەریش لەجێی خۆیدادەبێتو تێناکۆشێتو بژێوی خەرجناکات بۆ منداڵەکانی.

*ئەگەر دەستی چەپی نووسابوو بەیەکا بەرپرس رزقو رۆزی ژێر دەستەکانی دەگرێو دەستیش دەگرێت بەسەر ماڵوسامانی خێردا، خەوبینەریش زەکات نادادتو یارمەتی پێداویستیدەریش نادات.

*ئەگەر دەستی بەئاوەڵاوکراوی بینی بەرپرس (حەج)و جیهاد ئەنجامدەدات.

*ئەگەر دەستی بەنوقاوی بینی کاروبارەکان ئاڵۆز دەبنو غەمو پەژارە رووی تێدەکاتو خەوبینەریش بەوچەشنەیە.

*ئەگەربینی رانی حەزرەت(ﷺ) جوانو پڕموە هۆزو خانەوادەکەی بەزۆری بەهێز دەبن.

*ئەگەر قاچەکانی (ﷺ)بینی درێژن تەمەنی فەرمانڕەوا درێژدەبێ.

* ئەگەر لەنێو سەربازدا بینی چەکی پێوەبوو و پێدەکەنین‌و سەرسامبوون لەوساڵەدا سوپای موسوڵمانان دەشکێن ، ئەگەر لەنێو سەربازێکی کەمدا بەدیکردو چەك‌و جبەخانەیان تەواو نەبوو وملکەچی‌و رسواییان پێوەدیاربوو موسوڵمانان سەردەکەون بەسەر دوژمنانیاندا بەپێی ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللهُ بِبَدْرٍ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ (ال عمران:١٢٣).

* ئەگەر بینی(ﷺ)سەروریشی دادەهێنێ بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارەی خەوبینەر ، ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) لەمزگەوتەکەیدا بینی یان لە(حەرەم) یا لەشوێنێکی ناسراو هێزو تواناو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێ.

* ئەگەر بینی گرێی برایەتی دەبەستێ لەنێوان یاراندا زانیاری‌و فیقە بەدەستدەهێنێ.

* ئەگەر گۆڕی پێغەمبەری (ﷺ) بینی دەوڵەمەند دەبێ ، ئەگەر بازرگانیشبوو سوودو قازانج لەبازرگانیەکەیدا دەکات، ئەگەر زیندانیکرابوو رزگاریدەبێ.

* ئەگەر بینی پێغەمبەر (ﷺ) بوە بەباوکی ئاینی کزدەبێ‌و دڵنیایی لاواز.

* ئەگەربینی یەکێك لەهاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) بوە بەدایکی باوەڕی زیاددەکات، ئەگەربینی بەدوای پێغەمبەردا (ﷺ) دەڕوات دوای سوننەتکەوتوە.

* ئەگەر بینی پێغەمبەر(ﷺ) تەماشای حاڵ‌و باریدەکات فەرمانی پێدەکات مافی ژنەکەی بدات.

* ئەگەربینی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نانەدەخوات فەرمان بەزەکات دەدات بەسەریا.

* ئەگەر پێغەمبەری(ﷺ) بینی بەتەنیا دەخوات خەوبینەر پارەو نان نادات بەسوالکەرو هیچ خێرێکیش ناکات فەرمانە بۆئەوەی خێر ئەنجام بدات.

* ئەگەر پێغەمبەری (ﷺ) بەبێ نەعل بینی وازی لەنوێژهێناوە بەکۆمەڵ بۆیە بریاری پێدەکات نوێژ بەکۆمەڵ ئەنجام بدات.

* ئەگەربینی سۆلەکانی لەپێکردوە بریاری جیهادو تێکۆشانی لەپێناوی خوادا دەدات بەسەردا.

* ئەگەر بینی تەوقەی لەگەڵکرد شوێنی سوننەتکەوتوە.

* ئەگەربینی خوێنی تێکەڵ بەخوێنی پێغەمبەر(ﷺ)بوە دەبێت بەزاوای کەسێکی رێزدار یان لەگەڵ زانایان تێکەڵی ژن‌و ژنخوازی بۆ دروستدەبێت.

*ئەگەربینی پێغەمبەر(ﷺ) پاقلەی دایە لەغەم‌و پەژارە قوتاردەبێ.

*ئەگەر شتێکیدایە تەڕو خۆشبوو وەك هەنگوین قورئان لەبەردەكات‌و زانیاری بەئەندازەی پێدانی ئەو بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی پێغەمبەر(ﷺ) وتاردەدات فەرمان بەچاكەو ڕێگری لەخراپە دەكات.

*ئەگەر بینی پێغەمبەر(ﷺ)شتێكی دەداتێ زانیاری دەستگیردەبێ‌و دوای حەقدەكەوێ بەلام ئەگەر گەڕاندیەوە روو لەبیدعە دەكات.

*ئەگەر پێغەمبەری(ﷺ)لەشێوەی لاوێكی بالابەرزابینی لەنێو خەلكیدا فیتنەو كوشتار بلاودەبێتەوە، ئەگەربینی پێغەمبەر(ﷺ)رەنگی هەلبزڕكاوە دەستبەرداری وێلی‌و سەرگەردانی لاوی دەبێت‌و بیر لەتەویەدەكاتەوە.

*ئەگەربینی رەنگی سپییە تەوبەدەكات‌و دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورەو كاروكرداری باشدەبێ‌و جێگیردەبێ، ئەگەربینی گلەیی‌و سەرزەنشتی لێدەكات یاخود دەنگی بەسەردا بەرزدەكاتەوە بیدعە دروستدەبێ لەئایندا، ئەگەربینی ماچیكرد بابڕوای هەبێ بەوەی لێیدەگێڕێتەوە.

*ئەگەربینی لەشوێنێكدا مرد سوننەت لەناودەچێ لەو شوێنەدا.

**پێغەمبەران( علیهم السلام ):** (ئیبن سیرین) دەلێت: خەوی پێغەمبەران (سلاوی خوایان لێبێت) لەدوو حال بەدەر نییە: یاخود مژدەیە یان ئاگاداریی ، هەروەها دوو جۆرە یەكەمیان: پێغەمبەرێك وەك خۆی بێت، ئەمەش بەلگەیە لەسەر چاكی خاوەن خەوەكەو بەرزی‌و پلەداریی‌و زالبوون‌و سەركەوتنە بەسەر دوژمنانیدا. دووەم: بەرووخسارێكی گۆڕاوو جیاوازو روویەكی گرژەوە دەیبینێ ئەمەش بەلگەیەش لەسەر خراپی حال‌و باری‌و قورسی بەلاو نەهامەتی ، پاشان پەروەردگار دەرووی خێری لێدەكاتەوە لەكۆتاییدا.

*ئەگەر بینی وەك ئەوەی پێغەمبەرێك بكوژێت ئەوا بەلگەیە لەسەر خیانەتكردن لەئەمانەت‌و ئەسپەردەو شكاندنی پەیمان بەپێی ئایەتی:﴿ فَبِمَا نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ وَكُفْرِهِمْ بِآيَاتِ اللَّهِ وَقَتْلِهِمُ الأَنبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ﴾ (النساء:١٥٥)ئەمەش بەكۆمەل.

*هەندێکدەڵێن: ئەوەی ببینیێ هەندێك لەپێغەمبەران (علیهم السلام) لێیدەدەن خوازوئاواتی لەدنیاو قیامەتدا بەدەستدەهێنێت.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی پێغەمبەران(علیهم السلام)بەڵگەبێت لەسەر کورِ بەهۆی سۆزو بەزەیی کەهەیەتی بۆیو پاراستنی لەئاگری دۆزەخ.

*هەروەها بینیان بەڵگەیە لەسەر ئاگاداریو مژدە.

*ئەگەر لەحاڵو باری گونجاودا بینینی یاخود لەدوویانەوە نوێژیکرد یا شوێنیانکەوت لەرێگەدا یان خواردنو ئاویان پێداو بەتامو خۆشبوو یان زانستێکیان فێرکرد هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر باشی شوێنکەوتنیانو پاراستنی سوننەتیانو بەپێچەوانەشەوە ئەگەر پێچەوانەیانبوو لەشوێنکەوتنیان یاخود سووکایەتیو گاڵتە پێکردنیان بەڵگەیە لەسەر بیدعەو گومرایی.

*بینینی پێغەمبەران بەڵگەیە لەسەر بینینی پادشاو دنیاو قیامەت، هەروەها بەڵگەیە لەسەر زانایانو نزیکیان لەپەروەردگارەوە بەهۆی شارەزاییان لەنوێژو زەکاتو یەکتاپەرستیو پەرستشی پەروەردگارەوە، هەروەها بەڵگەو نیشانەیە لەسەر فەرمانرِەوایانو وتاربێژانو پێشەوایانی رێزدار چونکە ئەوان بانگخوازی رێبازی پەروەردگارن.

- هەر پێغەمبەرێك (علیهم السلام) مرۆڤ ببینیێ بەشێوەیەکی باش بەڵگەیە لەسەر باش شوێنکەوتنی نەتەوەکەی بۆی یاخود نوێکردنەوەی رەوشو کارێکی باش لەلای ئەوانەوە سەرهەڵدەداتو بەپێچەوانەشەوە.

*ئەوەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات لەخەودا رووداو هەواڵێك بەئەندازەی خۆی سەری لێهەڵدەدات، ئەگەر شایستەی دەسەڵات یان دادوەریو وانەوتنەوەبوو بەتایبەت فەرمانبەرداری بەچاکەو رێگری لەخراپە بەدەستیدەهێنێت.

*ئەگەر لەخەودا بوو بەپێغەمبەر یان بانگخوازێك بۆ لای پەروەردگارو وەلامیاندایەوە پلەوپایەیەکی بەرز بەدەستدەهێنێت، وەگەرنا دەبێت بەدەلالّ یان بانگبێژ بەپێی ئاستو پلەی خۆی، یاخود بەلاو نەهامەتیەك بەپێی ئاستی خۆی دادەبەزێت بۆی بەپێی تاقیکردنەوەی ئەو پێغەمبەرە کەناوی هەڵدەگریێ یا بەشێوازی خۆی دەنوێنیێ.

*ئەوەی یەکێك لەپێغەمبەران ببینێ لەشوێنێکدایە ئەگەر لەجەنگدابن سەرکەوتوو دەبن بەسەر دوژمنەکانیاندا، ئەگەر لەتاقیکردنەوەو حاڵو بارێکی نائاساییدابن لەنەبوونیو قاتو قڕی پەروەردگار دەرویان لێدەکاتەوەو قوتاردەبن لەو حاڵە.

*ئەوەی ببینێ جلو بەرگی پێغەمبەرێکی خودای پۆشیوە ئەگەر شایستەی دەستەلاتبوو بەدەستیدەهێنێت، ئەگەر قوتابی زانستبوو، دەگات بەپلەوپایەیەکی بەرز و ئەستێرەی ناوبانگی بەدەر دەکەوێت.

*ئەگەر بینیبووە بەپێغەمبەر بەشەهیدی دەمرێت یان تووشی نەبوونیو قاتو قڕی دەبێتو پەروەردگار ئارامی پێدەداتو خۆڕاگری لەسەر بەلاو نەهامەتی دواتریش سەرکەوتوو دەبێت.

*ئەگەر بینی هەندێك کاری پێغەمبەران ئەنجامدەدەن لەبەندایەتیو چاکە بەلگەیە لەسەر راستی ئاینو دڵنیایی لەبیروباوەڕەکەی.

*ئەگەر بینی بووە بەیەکێك لەپێغەمبەران (سلاوی خوایان لێبێت) فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە دەکاتو نارەحەتیەکانی دنیا رووی تێدەکاتو خەمو پەژارە دەبارێت بەسەریا بەئەندازەی حاڵو باری ئەو پێغەمبەرە ، پاشان قوتار دەبێتو پەروەردگار ملکەچی ناکات.

*ئەگەر بینی یەکێك لەپێغەمبەران بێپارەیە یان داوایەکدەکات خوداوەند کاروباری بۆ ئاساندەکاتو داواکەی فەرو بەرەکەتی تێدەکەوێت بەهۆی ئەو پێغەمبەرەوە.

*ئەگەر بینی لەسەردەمی پێغەمبەراندایە (سلاوی خوایان لێبێت) رێزو پایەداریو دەستەلات بەدەستدەهێنێت ئەگەر شایستەبێت، وەگەرنا شەیتان یاری پێدەکات.

*ئەگەر یەکێك لەپێغەمبەرانی بینی لێی دەدات بەهیواو ئاواتی خۆیدەگات، ئەگەر پیاوێکی چاكو بەڕێز بێت.

*ئەگەر بینی پێغەمبەران(سلاوی خوایان لێبێت) گفتوگۆی لەگەڵدەکەن یاخود گفتوگۆ لەگەڵ یەکێکیان دەکات ئەگەر گفتوگۆکە خێرو باشبوو سوودو قازانجو رێزو پلەوپایەو ناوبانگ لەنێو خەڵکیدا بەدەستدەهێنێت.

**پێکەنین:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پێکەنین غەمو پەژارەیە بەپێی ئایەتی: ﴿ فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلاً ﴾ (التوبة: ٨٢).

هەروەها مژدەیە بەبوونی کوڕ بەپێی ئایەتی: ﴿ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ ﴾ (هود: ٧١).

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خۆشیو شادی ئەگەر قاقاو کەوتن بەپشتی تێدانەبێ، ئەگەر بەو چەشنەبوو بەڵگەیە لەسەر گریان.

*ئەگەر پێکەنین بەهۆی گاڵتەو شۆخیەوەبوو بەڵگەیە لەسەر نەبوونی جوامێری خەوبینەر لەکاتی بێداریدا.

*پێکەنین بەچاولێکەری بەڵگەیە لەسەر کەوتنەنێو کارێکی یاساغەوە.

*ئەگەر پێکەنینەکەی خەندەو بزەبوو کەسێکی باشەو ئەوبزەیەش شادیو خۆشییە.

*ئەگەر بینی زەوی پێدەکەنێ فەڕوپیت لەوشوێنەدا دەبێت.

*ئەگەر مردوویەکی بینی پێدەکەنێ لەقیامەتدا لەنازو نیعمەتدایە.

*پێکەنین سووکیو رەقییە بەتایبەت ئەگەر لەپایەدارانەوەبوو، بەڵگەیە لەسەر لابردنیان لەسەر کاروپیشە.

**پێنج یەکی دەستکەوت:** ئەوەی پێنج یەك دەربکات بەڵگەیە لەسەر پارێزگاریکردن لەپێنج نوێژەکە.

**پێنووس(قەڵەم):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەرئەوەی مرۆڤی پێ باسدەکرێو فەرمان بەهۆیەوە بەجێدەهێنرێ وەك دەستەڵاتدارو زاناو دادوەرو زوبانو شمشێرو کوڕو ئامرازی نێرینەی پیاو.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئامرازی نێرینەی پیاوو ئەوەی تیای دەنووسرێ مارە بڕەکەی بێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سلەو پەنجەو هاوسەر.

*هەروەها دەڵێن: قەڵەم بەڵگەیە لەسەر زانیاری، ئەگەر بینی قەڵەمێکی بەدەستهێنا زانیارییەکی گونجاووشیاو بەدەستدەهێنێت.

*هەروەها دەڵێن: چوونە نێو دەستەبەرکراویو ئەستۆ بەپێی ئایەتی: ﴿ وَمَا كُنْتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ ﴾ (آل عمران : ٤٤).

*دەگێڕنەوە پیاوێك بە(ئیبن سیرین) دەڵێت: لەخەودا بینیم دانیشتووم‌و قەڵەمێکم لەپاڵدابوو هەڵمگرت دەستمکرد بەنووسین پێیو لەلای راستمەوە قەڵەمێکیترم بینیو هەڵمگرتو بەهەردووکیان دەمنووسی، (ئیبن سیرین) لێی پرسی: کەسی غەریبو ئاوارەت هەیە، وتی: بەڵێ، ئەویش وتی: دەگەڕێنەوە بۆ لات.

*ئەگـەر نووسـەرێك بینـی قەڵـەمێكی بەدەسـتەوەیە دڵنیادەبێـت لەهـەژاریو پاراستنی پیشەكەی.
*ئەگـەر بینـی سـەرجەم ئامرازەكـانی نووسـینی بەدەسـتهێنا لەنووسـیندا پلەوپایەیەكی گەورە بەدەستدەهێنیٚو پێشی هاوچەشنەكانی دەداتەوە.
*قەڵـــەم فەرمانبەچـــاكەو رێگـــری لەخراپەیەو بوونی شـارەزاییە لەهـەموو پیـــشەیەكداو، قەڵـــەم هۆكـــاری هەمووشتێكە.
*قەڵەم كوڕێكی نووسەر.
*پیاوێك بینی قەڵەمێكی بەدەستهێناو خەوەكـــەی بـــۆ راڤـــەكارێكی خـــەو گێڕایـەوە ئـەویش وتـی: كوڕێكتـدەبیٚ زانیارییەكی باش فێردەبیٚ.
(نابلـسی) دەڵێـت: ئەگـەر نووسـەرێك بینـی قـەڵغانێكی پێوەیـەو قەڵـەمێكی بەدەسـتەوەگرتووە یـان پێنـووسو دەفتەرێكی بەدەسـتەوەیە دڵنیادەبێـت لەهـەژاری بەخزمـەتكردنی فـەرمانڕەواو كاربەدەستێك.
*قەڵـــەم هۆكـــاری هەمووشـــتێكەو پیاوێكـە دەچـێتە ژێـر دەسـتەبەری، ئەگەر نەچوە نێـو دەسـتەبەری ژنێكـی ئاینپەروەری رێزدار دەكات بەهاوسەری خۆی ، قەڵەمیش دەستەڵاتە.

*ئەگـەر قەڵـەمێكی بەدەسـتەوەبینیو قەڵـەمێكیش لەلایـەوە دانرابـوو لەگـەڵ براكەیـدا كۆدەبنـەوە، ئەگـەر دایكـی دووگیانبوو برایەكی دەبێت.
*ئەگــەر فەرمانڕەوایــەك قەڵــەمێكی بەدەستەوە بینی لەفەرمانڕەوای باڵاوە وەریگرتبوو پلەوپایەی بـەرزو فـەرمانی جێبـەجێكراو بەدەسـتدەهێنیٚ، ئەگـەر لــەكار لابرابــوو مولّــكو دەسـتەلاٚتێك بەدەستدەهێنیٚ.
*قەڵـەمو مەرەكـەب كـوڕە بۆیـەكێك ئافرەتی دووگیانی هەبێت.
*قـەڵم بەڵگەیـە لەسـەر سـوێندێك دەیخوات گەر یەكێك بەدەستەوەبیگریٚ خوداوەند دەفەرمویٚ: ﴿ن ، والقلم﴾ (القلم: ١).
*ئەگـــەر نووســـەرێك بینـــی بەپێنووسەكەی پیساییكرد لێكدانەوەی لەبژێویو رزقو رۆزیدایە.
*ئەگەر بینی قەڵەمەكەی دەخاتـە نێـو شووشـەیەك مەرەكەبـەوە كـاری زینـاو داوێنپیسی ئەنجامدەدات.
*دەگونجێـت قەڵـەم بەڵگـەبێت لەسـەر مرۆڤو خـاوەنی نهێنـی یـاخود زاڵبـوون بەسەر دوژمناندا.
*بینینی قەڵەم لەخەودا بەڵگەیەلەسـەر سـوێندێك كـەدەیخوات یـان

بۆکەسێکیتری دەخوات، ئەگەر بەسەرجەم تایبەتمەندییەوە بینی سوێندەکەی گونجاوو راستە، ئەگەر وانەبوو بەڵگەیە لەسەر سوێندی درۆی.

*دەگونجێت بینینی پێنووس بەڵگەبێت لەسەر زانیاریو پاراستنو پیشەی پیرۆز.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تەمەنێکی درێژو رزقو رۆزی.

**پێڵاودروو:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: کەسێکە کۆیلە دەفرۆشێت چونکە پێڵاو ئەلێکدانەوەدا ئافرەتە.

**پێڵووی چاو( پەڵك):** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا ئێش‌وژانی هەبوو باشە بۆسەرجەم خەڵکی بەتایبەت ژنان، ئەگەر پێڵوەکانی کەم گۆشتبوونو کێمو زامی تێدابوو بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە.

*هەروەها پێڵووی چاو بەڵگەیە لەسەرئەوەی مرۆڤ خۆی پێدەپارێزێت لەچەكو هاوچەشنەکانی.

*دەگونجێت پێڵووی چاو بەڵگەبێت لەسەر:

+براوخوشك.

+هاوسەرو منالّ.

+لاشیپانی دەرگا.

+منالّو نهێنیپارێز.

+گەنجینە.

+پاسەوانو چاودێر.

+پارێزەرانی ئەسپەردەو ئەمانەت.

+نەخۆشیو تورەبوون.

*ئەگەر پێڵووی مرۆڤێکی چارەنووسسازی بینی درێژبوەو یاری بەدەموچاوی دەکات بەڵگەیە لەسەر تورەبوونی لێیو ئاگادارییی بەکاروبارێك شایستەی چاو پۆشێن بێت.

*ئەگەر پێڵوو بەڵگەبوو لەسەر ژن پێڵوی سەرەوە بۆ نێرەو هی ژێرەوەش بۆ ژن ، ئەوەشی لەونێوانەدا دروستدەبێت بەڵگەیە لەسەر کورِ، فرمێسکیش بەخالّو نوکتە ئەو موەشی تێدایە بەڵگەیە لەسەر حاڵیانو قەڵغانو پارێزەرەوە لەخراپەو مەترسی، جوانیو پاکێتیان بەڵگەیە لەسەر باشی حالّوباریان.

*دەگونجێت لاوازییان بەڵگەبێت لەسەرکەموکوریو خۆپارێزیو نەزانین.

*پێڵوو بەهەور چوێنراوە فرمێسکەکانیش بەباران پێڵووی نەخۆش بەڵگەیە لەسەر عیشقو دڵئالودەبوون بۆ خەوبین.

*ئەگەر چاو بەڵگەبێت لەسەر مالّو دارایی پێڵوو زەکاتو قەڵغانیەتی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا قەڵغانی ئایینە، ئەگەر جوانی تیابەدیکرد لەئایندا بەو شێوەیەیە.

*پێڵووەکانی بینی سپیبوە بەڵگەیە لەسەر نەخۆشیەك تووشی سەروچاوو گوێچکەی دەبێت یان کەڕدەبێت.

**پێوانە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر خوازو ویستی دادوەر بۆ سکالاکارو لادانی بەلای چەپدا بەڵگەیە لەسەر هەواداربوونی دادوەر بۆ سکالالێکراوو هاوسەنگیو بەرابەری کێشانە دادوەرییەتیو لاریو خواریشی ستەمو زۆرداریيەتی.

*پیانووسانی بەرد بەتایەکی کێشانەدا بۆرێکبوونەوەو بەرابەری بەڵگەیە لەسەر درۆو خراپی.

*وتراو: پڕی تایەکانی بەڵگەیە لەسەر زانیاری دادوەرو لێهاتوویيو کەمو کورپیشی بەڵگەیە لەسەر نەتوانینی دەستەلاتداریتی.

*ئەگەربینی فلس دەکێشێ گەواهی درۆدەدات.

*کێشانەی وشکەفرۆشەکان گەنجینەداری ماڵە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی کێشانەیەکیان دایە دەستەلات بەدەستدەهێنێ بەهەمان شێوە ئەگەر خۆی بەکێشەرو پێوانەگەر بینی.

*ئەگەربینی خەڵکی گزیو دزی لەکێشانەکەیاندا دەکەن دادوەر لەحەقو راستی لادەدەن.

**پێوەر( ئەندازە ):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پاکییەو (صاع)یش بەوچەشنەیە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بەئەندازە دەستنوێژی دەگرتو بە(صاع)یش خۆیدەشت.

**پێوەری ئاو:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بارانبارینو سۆزو بەزەیی لەلایەن خوداوەو خۆشیوشادی دوای ناڕەحەتی.

*ئەگەربینی ئاوگەیوەتە ئاستی خۆیو بیناکەی دیاریکراوە بەڵگەیە لەسەر مژدەو خۆشیو فەرپیت، ئەگەر بەوێرانەیی بینی یاخود بەڕەشی یا بۆنەکەی ناخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر نەبوونیو ناڕەحەتی. دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پادشای ئەو هەرێمە یان دادوەرەکەی، ئەو خێرو شەڕەشی تێدا دەبینرێ هەر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاتنی مانگەکانی (حەج)و جەژنو خۆشی دەربرین.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+شادیو خۆشی.
+لانـەی دەسـتەلاَت لادەداتو دەڕوات لێی.
**پێوەند(کۆت)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "پێوەندم پێخۆشـەو رقـم لـەکۆتو بەنـد دەبێتەوە"[1].
*پێوەند خۆڕاگرییە لەئایندا، ئەگەر لەزیوبوو خۆڕاگرییە لەهاوسەرداریدا، ئەگەر لەزێڕبوو خۆڕاگرییە لەکارێکی خرپـدا، ئەگـەر لـەقورقوشمبوو خۆڕاگرییە لەکارێکدا لاوازیو سستی تێدایە، ئەگەر پەتبوو خۆڕاگرییە لەئایندا بەپێی ئایەتی: ﴿ وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ ﴾ ( آل عمران: ١٠٣).
*ئەگەر لەداربوو خۆڕاگرییە لەگەڵ دووڕوویی ، ئەگەر لەپەڕۆ یان دەزوبوو لەکارێکدایە بەردەوامی تێدا نییە.
*ئەگەر پێوەنددار بەرینبوو یاخود لەمزگەوتێکدابوو خۆڕاگریە لەسەر گوێڕایەڵی بۆ پەروەردگار، ئەگەر دەستەلاَتداربوو لەگەڵ ئەوەشدا شمشێری هەڵگرتبوو خۆڕاگرییەتی لەدەستەلاَتو پۆستەکەیدا ، ئەگەر لەدنیاخوازانبوو خۆڕاگرییە لەسەر دنیاخوازی.
*پێوەند بۆ ئەوەی نیازی سەفەری هەیە رێگرییە، بۆ بازرگان خۆشحاڵییە، بۆ غەمبار بەردەوامبوونی غەمو پەژارەکەیەتی، بۆ نەخۆش درێژخایاندنی نەخۆشییەکەیەتی.
*ئەگەر بینی لەپێناوی خودایا پێوەندکرا هەوڵو تەقەلا دەدات لەبژێوی ماڵو منداڵو چاودێریاندا.
*ئەگەر بینی لەشاری خۆیدا پێوەندکراوە یان لەگوندێکدا لەوشوێنە نیشتەجێدەبێ.
*ئەگەر بینی لەماڵێکدا پێوەندکراوە بەژنێك تاقیدەکرێتەوە.
*ئەگەر پێوەندەکە تەسکبوو کاروباری لێتەنگدەکرێ.
*پێوەند بۆ خۆشحاڵو شادمان بەردەوامبوونی شادیو زیادبوونیەتی.
*ئەگەر پێوەندکراو بینی پێوەندێکیتری پێوەیە ، ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێ ، ئەگە بەندکرابوو وادەی بەندکردنی زۆر دەخایەنێ.
*ئەگەر بینی بەدارێکەوە بەستراوەتەوە لەکاری پیاوێکی دووڕوودا دەگیرێو زیندانی دەکرێ.

---

[1](ئەبوداود) (٥٠١٩)و (ئەحمەد) لە(مسندە) کەیدا (٢/٥٠٧).

*ئەگــەر بینــی پێوەنــدکراوەو جلوبــەرگێکی ســەوزی پۆشــیوە پلەوپایــەی لەئاینــدا لەبــەجێهێنانی پاداشتێکی مەزندایە مەترسیدارە.

*ئەگەر سپیبوو پلەوپایەی لەزانیاریو فیقهـو کـارێکی شـکۆداری جواندایـە، ئەگـەر سـووربوو پلەوپایـەو ئـارەزوو خۆشییە، ئەگەر زەردبوو نەخۆشییە.

*ئەگــەر بینــی بەپێوەنــدێکی زێــڕ بەســتراوەتەوە چــاوەڕێی مــاڵو سامانێکە بەسەرچوە.

*ئەگـەر بینـی لەکۆشـکێکی شووشـەدا بەســتراوەتەوە هاوەڵایــەتی ژنێکــی بــەڕێزدەکاتو بــەردەوام دەبــێ لەهاوەڵایەتیکردنیدا.

*ئەگـەر لەسـەفەردابوو بـەهۆی ئـەو ژنەوە دەمێنێتەوە.

*ئەگەر لەگەڵ پیاوێکیتردا بەپێوەندێك بەســترابوەوە بەڵگەیــە لەســەر ئەنجامــدانی گونــاهێکی گــەورە کەواترسی تۆڵەسەندنی دەستەلاتداری هەیە، پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ﴾ (ابراهیم: ٤٩).

*هەروەها دەڵێن: پێوەنـد لەبنەڕەتـدا پیریو هەژارییە.

*هەندێکدەڵێن: پێوەند بەڵگەیە لەسەر سەفەر.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا بەسـترایەوە خەوەکەی بۆ شـەڕەنگێز بەڵگەیـە لەسـەر گرفـت بـۆ زینـدانیان چونکە پێوەند بۆ هەردوو قاچ بەکاردێ بـەلام بۆسـەرجەم خـەڵکی بەڵگەیـە لەسەر غەریبی یان سەفەر.



# تێ

## تا

**تا:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: (ئەبوسەعد (رەزای‌و رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: تا لەلێکدانەوەدا باش نییە ، ئاگاداریيە بۆ مردن‌و هەرکەسێك بینی تای لێهاتوە سەردەکات بەرەفتارو کارێکدا دەرەنجامەکەی بەتێکچوونی ئاینی کۆتایی دێت، بەردەوامبوونی تاش بەردەوامبوونە لەسەر گوناهو تأوان.

*تای رۆژ نا رۆژێك لەخەودا گوناهێکە تەوبەی لێدەکات دوای ئەوەی سزا دەدرێت لەسەری.

*تای چوارۆژ جارێك بەڵگەیە لەسەر چەشتنی سزای گوناهو تەوبەکردن چەندجارێك ، پاشان شکانی تەوبەکەی.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی تای لێهاتوە تەمەنی درێژدەبێت‌و لەشساغ دەبێت‌و ماڵ‌و دارایی زیاددەکات.

(نابلسی)دەڵێت: تا لەخەودا بەڵگەیە لەسەر قەرزدانەوە چونکە گوناهو تاوان دەسرێتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەرەشەو تۆڵە.

*ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر قەرز لەوانەیە سێسەدو شەست درهەم بێت، چونکە تای یەك رۆژ کەفارەتی ساڵێکەو ساڵێکیش سێسەدو شەست رۆژە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر جل‌وبەرگی جوان‌و قەشەنگ بەتایبەت ئەگەر ساردبێت لەهاویندا یاخود گەرم بێت لەزستاندا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دڵەراوکە بەهۆی هاوسەر یا منداڵ‌و شەریکەوە.

*تا بەجێهێنانی بەڵێنە چونکە بەشی هەموو مرۆڤێکە لەدۆزەخدا، ئەوەی لەخەودا ببینێ تای لێهاتوەو خەڵکی چاوی تێدەبڕن‌و تەماعیان تێکردوەو رووی تێدەکەن، تایەك تاو تاوبێت

بەڵگەیە لەسەر کەمتەرخەمی لەکاروباری ئایندا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر حەمام خەوبینەر بچێتە نێوی و تێدا تینوویەتی و ناڕەحەتی بێتە ڕێی.

**تاجەگوڵینە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر ژنێك تاجەگوڵینەی بەسەری خۆیەوە بینی شوودەکات بەپیاوێکی پلەوپایەدا یان دەوڵەمەند، ئەگەر دووگیانبوو کوڕیدەبێت ، ئەگەر پیاوێکیش بینی دەستەڵات لەنێو بێگانەدا بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر کەسێکی زیندانی خەوێکی ئاوای بینی دەستەڵاتدار ئازادیی دەکات و لەگەڵ فەرمانڕەوادا پلەوپایەدار دەبێت هەروەك چۆن حەزرەتی (یوسف) ـ سەلامی خوای لێبێت ـ پلەوپایەداربوو لەگەڵ پادشای (میسر)دا، خۆئەگەر باوکی نادیاربوو ونبوو نامرێت هەتا چاوی پێی دەکەوێت چونکە ئەو تاجەگوڵینەیە باوکێتی.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم وەك تاجێکی زێڕ لەسەر سەرم دانرابێت ، ئەویش پێی وت: باوکت ئاوارەو غەریبەو بینایی لەدەستداوە، پاش ماوەیەك نامەیەکی پێگەیشت و ئەوەی تێدا نوسرابوو.

(نابلسی) دەڵێت: تاج لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زانیاری و قورئان و دەستەلات ، دەگونجێت لەسەرکردنی تاج بەڵگەبێت لەسەر نوێکردنەوەی شارێك یان ناچارکردنی دوژمن .

*تاج موڵکی عەجەمە یان دەستەلات و هەیبەتی پیاوە.

*ئەگەر ژنێك بینی تاجێکی ئاڵتوونی ڕووپۆشکراو بەدوڕی لەسەردایەو خۆی بێوەژن یان بێشووبوو شوودەکات بەپیاوێکی پلەوپایەدارو خاوەن سامان و کەم نەخۆشی و عەجەمی.

*ئەگەر تاجەکە بەتەنیا لەزێڕدروستکرابوو مێردێکی بەتەمەنی دەبێت و ماڵ وسامانێکی بۆ بەمیراتی دەمێنێتەوە.

*ئەگەر مێردداربوو کوڕێکی دەبێت کاروباری ماڵ و خانەوادەکەی دەبات بەڕێوە.

*ئەگەر تاجەکە لەزێڕبوو ئەو ژنە بەخێرایی دەمرێت.

*ئەگەر دەستەڵاتدارێکی بینی تاجێکی ئاڵتوونی دەکاتە سەری و بێباوەڕی و ستەمداری نواندوە بینایی

لەدەستدەدات چونکە چاو ئاینە، ئەگەر بێباوەڕبوو ئەوا ئاینو چاوی لەدەست دەدات، ئەگەر ئاینی لەدەستدا چاوو بینایی نامێنێت.

*ئەگەر تاجێکی کرایەسەر لەئاڵتوون دەستەڵاتێکی لەعەجەم دەستدەکەوێت ئاینو دینداری لەدەستدەداتو دووڕوویی دەنوێنێ لەبەدەستهێنانی ئاڵتووندا.

*ئەوەی ببینێ سەری بوە بەتاجو خۆشی شایستەبێت دەستەڵاتێك لەنێوگەلەکەی خۆیدا بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر ژنێك مێردەکەی بینی نەخۆشکەوتو تاجەکەی لێفڕێندرا مێردەکەی دەمرێت.

**تاجە گوڵینەی پادشا:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: تاجە گوڵینە وەك تاج وایە، هەروەها دەڵێن: ماڵێکی زیادەو زانستە یان کوڕێکە خودا دەیبەخشێ بەباوكو دایك.

*بۆ ژنیش پیاوێکی عەجەمییەو بۆ پیاو بەسەرچوونی ئەوەیە کەدەدرێتە پاڵی، چونکە ئاڵتوون خراپە.

*ئەگەر بازرگانێك تاجەگوڵینەیەکی بەسەرسەرییەوە دانا یاخود لێی برد ماڵو داراییەکەی لەکیسدەچێت.

*ئەگەر دەستەڵاتدارێك داینا هەڵەو خراپە روو لەئاینیدەکات.

*ئەگەر پادشاو سەرۆکێك تاجەگوڵینەکەی بینی بەسەرسەرییەوە دانرا یان لێی برا موڵكو دەستەڵاتی بەسەر دەچێت.

**تاریکایی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا تاریکاییو سەرسامییە، ئەگەر لەتاریکایی هاتەدەرەوە بۆ رووناکی موسوڵماندەبێت، ئەگەر بێباوەڕبوو یان سەرپێچیکار تەوبەدەکات، ئەگەر زیندانیبوو قوتاردەبێ لەزیندان.

*تاریکایی بەڵگەیە لەسەر ستەم، ئەگەر چوە تاریکاییەوە ستەمکارە.

*ئەگەر تاریکایی بینی ستەمدەکات، بینینی تاریکایی بەڵگەیە لەسەر تاریکایی دڵو چاو.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تەنیایی لەگەڵ خۆشاردنەوە لەخەڵکی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+سەرکەوتن.

+تاریکایی یان زاڵبوونی رەشی بەسەر زەویدا.

**تاق:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: تاقی گەورەو فراوان بەڵگەیە لەسەر باشی رەوشتی ژن، تاق دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خراپی رەوشتی.

*ئەگەر بینی لەتاقێکی تەنگا دانیشتوە هاوسەرەکەی تەلاقدەدات بەنهێنی، ئەگەر شوێنەکەی لەنێو تاقەکەدا فراوانبوو بەنهێنی لەلایەن مێردەکەیەوە تەلاقدەدرێ.

(نابلسی) دەڵێت: تاق لەماڵدا بەڵگەیە لەسەر:

+ئەو چاودێرانەی نهێنی ماڵدەزانن.

+دەرووکردنەوەو بەتاڵبوونەوەی غەم و پەژارە.

+هاتنی پشوو لەولایانەوە کەتاقەکەی تیایە.

+بیستنی هەواڵو دەنگوباس.

+ژنو منداڵ.

*ئەگەر بینی لەخەودا تاقی هەیە لەشووشەی رەنگاو رەنگ بەڵگەیە لەسەر رواندنی دارو درەختو گەنینی بەروبوومو بوونی منداڵی نوێو جلوبەرگی رەنگاو رەنگ.

*ئەگەر تاقێکی بەستراوی بینی سوورە لەسەر بەستنی گرێی مارەیی.

**تاقدار:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر هاوسەری شتومەکداری خاوەن منداڵو بۆ خزمەتکاران خزمەتەو ئەوانی دی جوانکارییە بەپێی ئاستی خۆی.

**تاڵ:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا خێرو ماڵو سامانە دەگات بەخاوەنەکەی.

**تالآنی هاوەڵ پەیداکاران لەجەنگدا:**

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی بەڵگەیە لەسەر دەرخستنی نهێنیو کەوتن بەسەر هەواڵو دەنگوباسدا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+بەلآو نەهامەتی.

+نەخۆشیو تورەییو بێزاریی.

*ئەگەر موسولمانان بێباوەڕانیان تالآنکرد بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجو رزقو رۆزی بۆ ئەوان ، ئەگەر بێباوەڕان موسولمانانیان تالآنکرد بەڵگەیە لەسەر لاوازیانو تێکچوونی حاڵو باریان.

**تاوان(گوناه):** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیەلەسەر بێباوەڕییو شوێنکەوتنی وێڵیو سەرگەردانی.

**تاوانو گوناه:** (نابلسی)دەڵێت: تاوانو گوناهی مردوو لەخەودا بەرانبەر یەکێکیتر بەڵگەیە لەسەر کەوتنە نێوکاری نارەواو نادروستەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گەیشتن بەهیواو خوازو ویست.

*ئەگەر لەخەودا تاوانو گوناه ئەنجام بدات بەڵگەیە لەسەر راو.

**تــاوس**[1] : (ئـيبن سـيرين) دەڵێـت: تاوسی نێرینە پادشـايەكی عەجەمييـەو مێيەكەشـی ژنێكـی عەجـەمی شـۆخو شەنگوماڵو سامانداره.

ئــەوەی تــاوس‌و كــۆتر بەيەكــەو كۆدەكاتــەوە پيــاوێكی دەويتــەو ژن‌و پيـاو بەيــەك دەگەيــەنێ بــۆ كـاری داوێنپيسی.

*هــەروەها دەڵــێن: تــاوس بەڵگەيــە لەســـەر خــەڵكی دەم بەخەنـــدەو پێكەنين.

(نابلسی) دەڵێت: جوانی تاوس رەنگی ئافرەتەو پەڕەكانی ماڵو سامانيەتی‌و سەربڕينيشی مەرگيەتی ، گۆشتەكەشی ئــەو مــاڵو دارايــيــە كەبــەميراتی بۆيدەمێنێتەوە.

*تاوســی نێرينــە فەرمانڕەوايــەكی عەجەمييە.

*ئەگەر بينـی نامـە بـۆ تـاوس دەنێـرێ ئـەوە نامـە بـۆ فـەرمانڕەوای عەجـەم دەنێرێ.

*هــەروەها بەڵگەيــە لەســـەر گــەل‌و نەتەوەيەكی رووخۆش.

*هــەروەها دەڵــێن: تــاوس ژنێكــی عەجـەمی ناموسـوڵمانە، ئەگــەر بينــی تاوســێكی بەدەســتهێنا يــان بــوو بــــەخاوەنی زاڵـــدەبێ بەســــەر فەرمانڕەوايەكی عەجەميدا.

*ئەگەر بينی زاڵبـوە بەسـەر تاوسێكی مێينەدا ماڵو كورپيدەبێت.

*تـاوس بـۆ يـەكێك ببێـت بـەخاوەنی بەڵگەيە لەسەر:

+وێڵی‌و سەرگەردانی.

+خۆپەسەنديی بەجوانی.

*دەگونجێــت خەوەكــەی بەڵگــەبێت لەسەر:

+دووزوبانی.

+لەخۆبايبوون.

+درۆ.

+رووكردنە دوژمنان.

+رەواندنــەوەی نيعمــەت‌و دەرچــوون لــەنازو نيعمــەت‌و چــوون بــەرەو بەدبەختی‌و نەبوونی.

+ئاڵتوون‌و تاج‌و سەوڵەدان.

+هاوسـەری جـوان‌و شـۆخ‌و شـەنگ‌و كوڕانی قۆزو جوان.

*ئەگەر بينی گۆشـتی تـاوس دەخـوات ژنەكەی دەمرێت‌و دەبێت بـەميراتگری، هەروەها دەڵێن: ماڵو دارايـی لـەژنێكی عەجەمی بەدەستدەهێنێ.

---

[1] **تاوس**: باڵندەيەكی جوانی پەڕ رەنگاو رەنگە. (وەرگێڕ)

*ئەگەر پەڕی تاوسی بەدەستهێنا لەلایەن ژنێکەوە ماڵو سامان بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی بەچکەکانی بەدەستهێنا لەکوڕی ئەو ژنەوە ماڵو سامان بەدەستدەهێنێت.

*وتراویشە: ئەوەی یەکێك لەبەچکەکانی تاوس بەدەستبهێنێت کوڕێکی دەبێت.

**تاوە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ژنێکە کوڕێکی بۆناژیو هەمیشە فرمێسكو ئەشك لەچاوە بەهۆی ئەو حاڵەوە، هەروەها وتراوە: فرمێسکی غەمو پەژارە گەرمەو هی خۆشیو شادیش ساردە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: دەگونجێت تاوە بەڵگەبێت لەسەر بژێوی پەیداکار یان کەیبانووی ماڵ بێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+دادوەر.

+پارەوەرگر.

+کەسانی سووكو نزم.

+دیلەوان.

+پزیشك.

+خاوەن مراوی.

(نابلسی) دەڵێت: بۆ کەسێك بەدەریادا سەفەر بکات بەڵگەیە لەسەر نوقمبوون.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر شەڕو خراپەو نوێژچوونو شوێنکەوتنی ئارەزوو.

*هەروەها تاوەی پەنیر بەوچەشنەیەو تاوەش وەسوەسەکارو دووزوبانە.

## ت ر

**تراویلکە( سەراب ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی تراویلکە ببینێ لەوکارەی چاوی تێبڕیوە هیچی لێدەست ناکەوێت بەپێی ئایەتی: ﴿كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ﴾ (النور: ٣٩).

(نابلسی) دەڵێت: تراویلکە لەخەودا دووڕووییو بێباوەڕیە لەئایندا یاخود خوازیاربوونی دنیاو جوانیەکانیەتی.

*دەگونجێت تراویلکەبینین بەڵگەبێت لەسەر هیواو ئاواتخوازی بۆ کارێك پێی ناگات، ئەگەر خەوبینەر گەواهیدەربوو بەدرۆ گەواهی دەدات یان زانای بیدعەکارە، دەگونجێت تراویلکە هەواڵبێت نەك راستی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەرکەوتنی ئالآیەك لەشوێنێکدا تراویلکەو سەرابەکەی تێدا بینراوە.

**ترسان( تۆقان ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ئەنجامدانی گوناهو تاوانو کاری ستەمکاری.

*ئەگەر بینی لەترسا مرد بەهەژاری دەمریو ستەمیش لەئەستۆیدا دەمێنێتەوە ، لابردنو لەکارخستنیش پەیمانە ، هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر تەلاقدانی ژنو رووی گرژیش بەڵگەیە لەسەر کچ بەپێی ئایەتی: ﴿وإذا بُشِرَ احَدُهُم بالأنثى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوداً وَهُو كَظِيم﴾ (النحل:٥٨).

**ترسنۆك:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر خۆشحاڵیو چاکبوونەوە لەنەخۆشیو بۆجەنگاوەریش هیچ خێرێکی تێدا نییە، چونکە بەڵگەیە لەسەر ترس لەکاتی بەرەنگاربوونی دوژمندا.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ئازایەتی هەتا دەترسێت بەرانبەر نەیارەکەی.

**ترس وبیم:** ترسو بیم بەڵگەیە لەسەر تەوبە، هەموو کەسێکی ترساو تەوبەکارە.

*دەڵێن: ئەگەر بینی دەترسیٚ لەترس وبیم دڵنیا دەبێتو پلەوپایە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی دڵنیایە لەترسو بیم تووشی ترساندەبێت.

*ئەگەر بینی چاوەڕێی ترسە کوشتاردەکات.

*ئەگەر بینی لەخەودا دەترسیٚو یەکێك پێیدەڵێت: مەترسە کتوپڕ نامرێتو بەڵکو دەژی تا کوێر دەبێت.

*ئەگەر بینی بەخوداوەند دەترسێنریٚ بەلاّم ناترسیٚ دەترسیٚو بەرلەوەی بترسیٚ دڵنیاییو هێمنی بەدەستدەهێنێتو ناوبانگدەردەکات ، ئەوەشی ناترسیٚ خراپەو زیانە.

**تریت:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر تریت زۆر چەوربوو دەستەلاّتێکی فراوانو دنیایەکی ئاوەلاّو بەرینە، ئەگەر چەوری لەگەڵدانەبوو دەستەلاّتو فەرمانڕەوایی بێسوودو کاڵکە.

*ئەگەر بینی لەبەردەستیدا لەگەنو ئەشتێك دانراوەو تریتی تێدایەو لێی دەخوات تەمەنی بەئەندازەی ئەوەی لێی خواردوە بەسەردەچێتو بەئەندازەی ئەوەی ماوەتەوە تێدا دەمێنێت ، چونکە تریت لەبناغەدا بەڵگەیە لەسەر ژیانی پیاو.

*ئەگەر تەشتو لەگەنێکی بینی تریتی تێدابوو، تریتەکە زۆر چەوربوو تەنانەت نەیتوانی بیخوات بەڵگەیە لەسەرئەوەی ماڵو سامانێکی زۆر کۆدەکاتەوە بەڵام کەسێکیتر دەیخوات.

*ئەگەربینی تریت لەبەردەستدایەو چەورو خۆش نییەو خۆشی بەخێرایی دەیخوات خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر ئومێد خواستنی مردنی بەهۆی تەنگی بژێوییەوە.

*ئەگەر تریتی لەبەردەستی خۆیدا بینیو لێی دەخوارد لەترسی ئەوەی نەمێنێت دەترسێ بمرێ وێڕای زۆری ماڵو نازونیعمەت.

*ئەگەر تریتەکەی چەورنەبوو، ئیرەیی بەربوو بێگۆشتبوو بەڵگەیە لەسەر کاروپیشەی پاكو خواناسیو پارێزکاری، ئەگەر هەر چەورنەبوو بەڵگەیە لەسەر پیشەی سووكو هەژاری.

*ئەگەر تریتەکە شلەی لەگەڵدابوو بەگۆشتی هەندێك لەدڕندەکان لێنرابوو خاوەنەکەی بەدوای کۆمەڵێکی ستەمکاردا دێتو دەترسێت لێیان یاخود لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ستەمکارەدا بازرگانی ئەنجامدەدات، بوونی چەوری تێدا بەڵگەیە لەسەر حەرامکردنی سوودی، خۆنەگەر بێچەوریبوو بێسوود دەبێت.

*ئەگەر تریتەکە لەشلەیەك دروستکرابوو گۆشتی سەگی تێدابوو بەڵگەیەلەسەر دەستەڵاتێکی بۆگەنو سووك بەسەر گەلو کۆمەڵێکی نەزان یاخود بازرگانیو پیشەسازییەکی سووك لەگەڵ گەلو نەتەوەیەکی سووكو رسوادا.

*ئەگەربینی هەموو تریتەکەی خوارد دەمرێت لەسەر هەژاریو نەبوونی.

*ئەگەر تریتەکە لەگۆشتی باڵندەی دڕندەبوو مامەڵە لەگەڵ گەلونەتەوەیەکی ستەمکاردا دەکات بەماڵی حەرام.

*بەشێوەیەکی گشتی تریت بریتییە لەژیانی پیاوو بژێویو سوودو کەڵکی بەپێی چەوریو حەلاڵیو حەرامیو جۆری گۆشتەکەی.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر تریتی کەشکیخوارد سەرقاڵو خەریکی پیشەیەکی بێکەڵكو سوود دەبێت.

**ترێ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مێوو ترێ بەڵگەن لەسەر ژنان چونکە خواردنی چێژو تامی تێدایە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر مارەبڕین چونکە وەك دەستەڵاتدارو زاناو بەخشندەی ماڵو دارایی وایە.
*ئەگەر بوو بەخاوەنی دارمێو هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکدەکات ئەگەر رەبەن بێت یان پیاوێکی دەستو دڵباش بەدەستدەهێنێ ، پاشان تەماشای چارەنووسی دەکرێ.
*ئەگەر لەکاتی بەسەرچووندابوو ژنەکەش نەخۆشبوو دەمرێتو چاك نابێتەوە، ئەگەر دووگیانبوو کچی دەبێت، ئەگەر خوازیاریدەروو پەیوەندییەکبوو یان ماڵو دارایی لەدەستەڵاتێکەوە دەویست یان ژنێك وەك دایكو هاوسەر بێبەشدەبێت.
*ئەگەر ژنەکەی مارەبڕیبوو ئەستەمە بەژنەکەی بگات.
*ئەگەر دوڵەمەندبوو هەژار دەکەوێ دوای بوون .
*ئەگەر دووڕوبوو لەبازاڕدا پشەوکارەکەی ساردی رووی تێدەکات.
*ئەگەر لەکاتی هاوینو تەواوبوونی وەرزدابوو پێچەوانەدەبێو هەموو ئەوەش باشدەبێ.
*ترێی رەش لەکاتی خۆیدا نەخۆشیو ترسو بیمە، دەگونجێت قامچی بێت بۆیەکێك خاوەنی بێت بەپێی دەنکەکانی بۆڵە ترێکە.
*ترێی سپی لەکاتی خۆیدا گوشینی دنیایەو خێرو بێریەتی، بەڵام ئەگەر لەکاتی خۆیدا نەبوو ماڵو سامانێك بەر لەکاتی خۆی بەدەستدەهێنێت.
*مێوژی رەشو سووروسپی خێروماڵو داراییە.
*ئەگەر بینی ترێ دەگوشێ وەك شەربەت مامەڵەی لەگەڵدابکە.
*هەروەها دەڵێن: ئەوەی ببێت بەخاوەنی بۆڵەترێ ماڵو داراییەکی جەمی لەهاوسەرەکەیەوە دەستگیردەبێ.
*هەروەها دەڵێن: بۆڵەترێ هەزار درهەمە.
*ترێی رەش ماڵو سامانێکە نامێنێت، ئەگەر بینی بەدارەکەوە شۆڕبویەوە سەرمایەکی سەختو ترسوبیمێکی زۆر رووی تێدەکات.
*هەندێك لەراڤەکاران دەڵێن: ترێی رەش خراپ نییە بەپێی ئایەتی: ﴿سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا﴾ (النحل: ٦٧).
*(زەکەریا) ـ رەزای خوای لێبێت - ترێی لەلای (مریەم) بەدیکرد بۆیە خراپ نییە، بەڵام زوربەی راڤەکارانیش رقیان لێدەبێتەوە، هەروەها دەڵێن:

لەپاڵ کوڕەکەی (نوح)دابوو کاتێ باوکی بانگیکرد لەوکاتەدا رەنگی سپیبوو کاتێ بانگیکرد دواتر رەنگی گۆڕا.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا رزق و رۆزییەکی باش و بەردەوام و فراوانەو لەکاتی خۆیدا فەرپیتی دنیایە بەدەر لەکاتی خۆشی خێرێکە بەر لەکاتی بەدەستی دەهێنێت، دەگونجێت حەرامێکبێت پێش کاتی بەدەستی بهێنێت.

*ئەوەی بۆڵە ترێیەك بەدەست بهێنێ یا لێیبکاتەوە ماڵێکی جەم و کۆکراوی لەژنێکەوە دەستگیردەبێت.

*ترێ رەشکە رزقێکە نامێنێتەوە، وتراویشە لەکاتی خۆیدا غەم و پەژارەیەو، ئەگەر لەکاتی خۆیدا نەبوو نەخۆشییە.

*ئەگەر ترێکە شۆڕبووەوە بەڵگەیە لەسەر ترس و بیمێکی توندو سەخت.

*ئەگەر ترێی رەشی لەدەرکی دەستەلاتدار لێکردەوە یا هەلگرت و زانی چەنی هەلگرتوە بەقامچی لێیدەدرێ بەپێی دەنکەکانی بۆڵە ترێکە.

*ترێی سپی هەرخێرو شیفاو چارەسەرە چونکە (نوح) (سەلامی خوای لێبێت) تووشی نەخۆشی (سیل)بوو خوداوەند نیگای بۆ ناردو ترێ بخوات و، ئەویش خواردی و چاکبووەوە لەنەخۆشییەکەی.

*ترێی رەش سوودێکی کەمە.

*هەروەها دەڵێن: ترێی رەش کەم و زۆری غەمە، لێکردنەوەی ترێ سوودێکی کەمە.

*ئەگەر بینی ترێ لێدەکاتەوەو ترێکە دەگرێتە ژنەکەی شەڕ لەگەڵ ژنەکەیدەکات و ئەوکاتەش قورس و گراندەبێ لەسەری.

*ترێ باشە لەکاتی خۆیداو بەڵگەیە لەسەر حەسوودو قازانج کەلەژنەوە دەستدەکەوێ یان بەهۆی ژنەوە.

*ترێ بەڵگەیە لەسەر رزق و رۆزییەکی باش لەگەڵ خۆشەویستی و برایەتی.

*دەگونجێت خواردنی ترێ لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر مەیخواردن.

*دەگونجێت ترێ رزق و رۆزیبێت لەکەسێکی رێزدارەوە.

*هەروەها دەگونجێت کەمی و خەوش و ناتەواوی بێت ئەگەر تەماشایکرد ، یان رەشەکەی شەوبێت و سپییەکەشی رۆژ.

## ت ف

**تف:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: تف ماڵو توانای پیاوە، ئەوەی دەبینێ تفدەکات سووکایەتیو توهمەتباری مرۆڤێکدەکات.

*ئەگەر تفی لەدیوارێککرد ماڵو سامانی لەجیهادو تێکۆشاندا خەرجدەکات یان ماڵو سامانی لەبازرگانیدا بەگەڕخستووە.

*ئەگەر تفی لەسەر زەویکرد کێڵگەو پارچە زەوییەك دەکڕێ.

*ئەگەر تفی لەدارێککرد پەیمانی شکاندوە یان سوێندی نەبردوەتەسەر.

*ئەگەر تفی لەمرۆڤێککرد توهەمەتباریکردووە.

*تفی گەرم: بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی . هی ساردیش: بەڵگەیە لەسەر مردن.

*ئەوەی ببینێ تفەکەی وشکیکردەوە هەژار دەکەوێت.

*ئەوەی ببینێ لیك لەدەمی دێت ماڵێك بەدەستدەهێنێت پاشان ئەو ماڵە لەدەستدەدات.

*ئەوەی ببینێ تف لەدەمی دێتو هیچ ئەندامێکی بەدی ناکەوێت بەڵام خەڵکی بەدەست هەڵیدەگرنەوە زانیاریەو لەنێو خەڵکیدا بڵاویدەکاتەوە ، ئەگەر لەگەڵیا خوێن هەبوو درۆ تێکەڵ بەڕاستی دەبێت.

*ئەگەر بینی لەدەمی ئاوێکی زۆر دێت گوزەرانو بژێوی فراواندەبێتو هاتنە دەرەوەی ئاو لەدەمی بازرگان بەڵگەیە لەسەر خێر.

*ئەگەر لیك لەدەمی بەلێشاو هاتە دەرەوە لەبەردەستی لاوێکدا نهێنی خۆی لای دوژمنانی ئاشکرا دەکات، ئەگەر خوێنی لەگەڵبوو درۆ دەکات لەهەندێك لەوەی پێی دڵخۆشە.

(نابلسی)دەڵێت: تفکردن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هێزو توانای پیاو، ئەوەی ببینێ تفەکەی وشکبوەتەوە بێتواناو کەمدەستەڵات دەبێت لەئانای ئەوەی هاوچەشنەکانی ئەنجامی دەدەنو کەم دوو قسە دەبێت.

*ئەوەی ببینێ کەف لەدەمی دێتە دەرەوە بەڵگەیە لەسەر قسەو گوتەی پڕوپووچ یان درۆیەك دروستکیردووە.

*تف لەخەودا بریتییە لەقسەی باشو دانسقە یان زانست یاخود ماڵو دارایی، دەگونجێت تف بەڵگەبێت لەسەر هێنانی پشوو و حەوانەوەو داواکردنی ژنو هاوسەر.

*هەروەها دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لەش ساغیو نەخۆشی.

*ئەگەر کەسێك بینی تفەکەی گۆڕاوە بەڵگەیە لەسەر خراپی حەزو ئارەزووی.
*بچڕانی تفیش لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تەواوبوونی پشوو ماندو دەرکردن و خۆشی، یاخود بەڵگەیە لەسەر لەدەستدانی منداڵ و خەم و پەژارە گرتن.
*ئەوەی ببینێ تفدەکات قسەی خراپ و نابەجێدەکات، ئەگەر تفەکەی خوێنی تێکەڵبوو یان بەڵغەما دەبوو سەبارەت بەباس و خواسێك دەدوێت مافی نییە قسەی تیا بکات.
*ئەوەی ببینێ تفیکرد بەڕووی کەسێکدا یان ئاژەڵێکدا قسەی حەرام لەزاری دێتەدەرەوە.

ت ل

**تلیاك:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گومان لەماڵ و سامان و منداڵ و هاوسەر.
*خواردنی بەڵگەیە لەسەر لێدان لەکاتی بێداریدا یاخود ئەوەی لەخەڵکیدەدات.
*تلیاك و شەرابی جۆ بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی ئاین یا هاوسەر یاخود پاشگەزبوونەوە لەئیسلام و شکاندنی تەوبە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەرزانی گەنم و خورما و ترێ و گەنمەشامی.

ت و

**توانجدەر( برینداکار ـ تانوتەدەر):**
(ئیبن سیرین) دەڵێت: توانجگرتن بەقسەو گوتە هەروەها برینداکردنیش بەشمشێرو گۆچان و ئاسن هەربەوچەشنەیە، ئەگەر بەیەکێك لەمشتانە ئامادەیکرد بەلام کەسی بریندارنەکرد دەیەوێت قسەیەك بکات بەلام نایکات.
*ئەگەر تێکۆشان لەپێناوی خودایابوو خۆی دەپێکراو نیشانبوو بەتیر پێداویستییەك بەنزیکی لەخوداوەندەوە بەجێدەهێنێ، ئەگەر دنیاداربوو ڕێزو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێ.
(نابلسی) دەڵێت: بریندارکردن بەرم لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ڕووداوێك و بەرەنگاری بەماڵ و هێزی پیاو.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر توانجگرتن لەئاین و گاڵتەو سووکایەتی پێکردن بە خێرۆمەندان.
*ئەگەر کۆمەڵێکی بینی بەچەك خۆیان بریندار دەکرد نەخۆشی و دەرد لەو ناوچەیە بلاودەبێتەوە.
*ئەگەر بینی خەڵکی کەوتوونەتە کوشتاری یەك گرانی لەوناوەدا

بڵاودەبێتەوە، ئەگەر جەنگان لەگەڵ دەستەلاتداردا نرخەکان دادەبەزن‌و هەرزانی دەکەوێتەوە.

**توندوتیژ:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بەتوندوتیژ ناوزەدکرا لەخەودا ئەگەر فەرمانڕەوابوو لەکار لادەبرێ: ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ﴾ (آل عمران : ١٥٩).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر خێری ئەنجام نەدا لەجەنگدابوو سەرناکەوێت، ئەگەر بازرگانی هەبوو زەرەردەکات.

**توێ توێی گۆشت:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی شەڕێکی دیارە یان بەسەرچوە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆشنوودی.

**توێشوو:** ئەگەر لەخەودا توێشوی هەڵگرت بەڵگەیە لەسەر خواناسی.

*دەگونجێت بۆ هەژار بەڵگەبێت لەسەر دەوڵەمەندی‌و بۆ قەرزاریش لەسەردانەوەی قەرزەکەی.

**توێشەبەر:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا رزقجێگیربوونە دوای سەفەر، حەزرەتی (عیسا)ش (سەلامی خوای لێبێت) دوعای بۆ کردووە.

*هەروەها دەڵێن: خاوەنی ئەو خەوە قەرزارەو قەرزەکەی دەداتەوە.

**توێکڵ(قەتماغە):** (نابلسی) دەڵێت: توێکڵی گوێزو بادەم لەخەودا پۆشاکە بۆ یەکێك بیبینێ.

*هەروەها دەڵێن: بەمنداڵی لەبارچووی ژن لێکدەدریتەوە چونکە جیادەبێتەوە لەوەی لەنێویدایە هەروەك چۆن ژن منداڵی نێوسکی فرێدەدات.

*توێکڵ رووپامایی‌و خۆنواندن‌و دووڕووییە.

## ت وو

**توو:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: خواردنی توو بەڵگەیە لەسەر کاروکاسبی فراوان بۆئەوەی خەودەبینێت، تووی رەش دینارەو سپش درهەمەو دارەکەشی پیاوێکی خاوەن ماڵ‌و منداڵە.

(نابلسی)دەڵێت: توو بەڵگەیە لەسەر:

+چاکی ئاین‌و دڵنیایی.

+لەشاساغی بۆیەکێك بیخوات.

**تووترك فرۆش:** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر چارەسەر لەنەخۆشی‌و پاکبوونەوە لەگوناهو تاوان ئەگەر چوە لای نەخۆش دەمرێت.

**تووتی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: تووتی پیاوێکی جامبازی درۆزن‌و ستەمکارە، هەروەها دەڵێن: پیاوێکی فەیلەسوفە.

(نابلسی)دەڵێت: بەچکەی تووتی کوڕی فەیلەسوفە، تووتی بەڵگەیە لەسەر ژنی

جوان‌و سەرنجڕاكێش كەلەدواندندا زمان پاراوەو ڕەوانبێژە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنی عەجەمی یاخود بەڵگەبێت لەسەر پیاوێك زوو زوو وێڵ‌و سەرگەردان ببێت‌و كاسەلێس بێت یان داوێنپیس‌و بەدڕەوشت.

**توور:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێكی دەشتەكییە.

*توور (حەج)و ڕزق‌و ڕۆژی حەلاڵە.

*ئەگەر تورێكی بەدەستیەوە بینی كردارێك ئەنجامدەدات خێری تێدایەو پەشیمانی ڕووی تێدەكات.

**توورەكە( هەمانە ـ كیسە ):** (نابلسی) بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر وەچەو منداڵ‌و زانیاری‌و ژیری‌و بێداری.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر مرۆڤ، ئەگەر بەبەتاڵی بینی بەڵگەی مردنی خاوەن تورەكەكەیە.

*هەروەها دەڵێن: توورەكە نهێنییە.

*ئەگەر لەناوەڕاستی خۆیدا توورەكەو كیسەیەكی بینی بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی بۆ ئامێرێكی باشی زانیاری، ئەگەر پارەو پوولی تێدابوو زانیارییەكی ڕاست‌و دروستە، ئەگەر شكابوو لەكارەكەیدا پێویستی بەهەوڵی زیاترە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئەبوبەكر) (ڕەزای خوای لێبێت)و دەڵێت: لەخەودا بینیم كیسەكەم هەڵڕشت هیچم نەبینی جگە لەزەرووییەك، ئەویش وتی: كیسەكە لەش‌و لاری مرۆڤەو، درهەم‌و پارە یادو باس‌و قسەیە، زەرووەكەش نامێنێتەوە. ئەگەر مرۆڤێك بینی كیسەو هەمبانەكەی هەڵڕشت دەمرێ‌و باس‌و خواسی لەدنیادا دەبڕێ. دەڵێن: كاتێ پیاوەكە لەلای (ئەبوبەكر) چوە دەرەوە پاش ماوەیەك كوژرا.

هەروەها كیس بەڵگەیە لەسەر شتومەك‌و نهێنی‌و دەركەوتن‌و سەرهەڵدانی نهێنییەو خیانەتكردنە لەئەمانەت.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر مۆرانەی لەكیسەدابینی بەڵگەیە لەسەر مەرگی، هەروەك چۆن جنۆكە بەڵگەبوو لەسەر مەرگی سولەیمان (سەلامی خوای لێبێت) كاتێ گۆچانەكەیان خواردو كەوت.

*كیس بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤ دەیگرێتە خۆی‌و دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دڵی خاوەنەكەی.

*بینینی توورەكە بەڵگەیە لەسەر:

+دووبرا.

+دووهاوسەر.
+دووکوڕی شەریك.
+سەفەرو گەشت.
*ئەگەر بینی تورەکەیەکی پێیە یان کڕیویەتی یان پێی بەخشراوە لەخەمو پەژارە قوتاردەبێت و دەرووی لێدەکرێتەوە.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: توورەکە نهێنییە، ئەگەر بینی تورەکەیەکیدا بەپیاوێك و درهەمو دیناری تێدابوو ئەگەر درهەمو دینارەکان باشبوون نهێنیەکی باشیان لادەدرکێنیَ ، ئەگەر خراپبوو نهێنیەکی خراپی لاباسدەکات.
*ئەگەر بینی توورەکەکە دەکاتەوە ئەو نهێنیە دەدرکێنیَ.
*مەشکەو کونەش پیرێکی ئەمنەتپارێزەو ماڵ و سامانی لادادەنرێ.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا نهێنییە، ئەگەر بینی لەخەودا خێریکرد بەشتێکی باش باشدەبێ، بەڵام ئەگەر شتێکی خراپی وەك مردارەوەبوو یان مەی یان کەلاکیکرد بەخێر بەخراپی مامەڵە بەماڵ و سامانی خۆی یان کەسانیترەوە دەکات.

**توورەبوونی مرۆڤ بۆ ماڵی کەسانیتر:** (نابلسی) دەڵێ: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رێکەوتنی خراپ بۆیەکێك بیەوێت هاوسەربگرێ یاخود بەڵگەیە لەسەر ماڵی حەرام یان ئەو ماڵ و سامانەی لەبنەڕەتدا بەسوو پەیدابوە، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ وَلاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالبَاطِلِ﴾ (البقرة:١٨٨) توڕەبوونیش لەریزی وتەی پووچ و بەتاڵدایە.

**تووڕەیی:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی بەتووڕەیی لەماڵی خۆی هاتە دەرەوە سووکایەتی بەئاین و خوداوەند دەکات، ئەگەر تووڕەییەکەی لەپێناوی خوادابوو هێزو تواناو دەستەلات بەدەستدەهێنیَ.

**تووکن( قژن ):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی ئەدیب و چاکەکارەو ماڵ و سامانی لەسەر شوێنکەوتەی زۆری و دەنگی زانیاری و شارەزاییە.

**تووکی پێش ( تووکەبەر ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کەمی لەخەودا باشە لەسوننەتداو زۆریشی زیادبوونی ماڵ و دەستەلاتە لەلایەن پیاوێکی عەجەمییەوە بەدەستیدەهێنن.
*ئەگەر بینی سەیری پێشی خۆیکردو تووکی پێوە نەبینی وەك ئەوەی هەرگیز تووکی لێدەرنەهاتبێت بەڵگەیە

لەسەر ئەوەی زیانێکی دارایی رووی تێدەکات، ئەگەر موویەکی زۆری پێوەبوو ماڵو سامانێکی بێشومار بەدەستدەهێنێ لەگەڵ تێکچوونی ئاینو لەکیسچوونی پیاوەتیو جوامێری.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر مرۆڤ لەخەودا تاشی یان لایبرد بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی قەرزاریو غەمو پەژارە.

*پێشی ژن باغو بێستانە، وتراویشە بەڵگەیە لەسەر:

+تەلاقدان.

+خولی مانگانە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+سوننەو شوێنکەوتنی.

+نوێژو سوننەتەکانی.

+بەروبووم.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو رووەکەی سوودو قازانجی لێوەرگرتوە.

## ت ۆ

**تۆپ** : (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەنگەدەنگو توێژ لەسەر دنیا کۆمەڵێ پەسەندیدەکەنو هەندێکیش نکوولی لێدەکەن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەرو گواستنەوەی لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر، ئەگەر لەپێستەبوو سەرۆك یا زانایە.

*یاریکردن بەتۆپ دژایەتییە چونکە هەر کەسێ یاری پێبکاو بیبات دەیکێشێ بەزەویدا.

**تۆڕ**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: تۆڕ بەدەستی کەسێکی موسافیرەوە بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەیو بۆکەسێکی پەژارەداریش بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی غەمو پەژارەی، بەڵام بۆ راوچی بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجو خێر.

(نابلسی) دەڵێت: تۆڕ لەخەودا فروفێڵو رزقو رۆزیو زانیاریو گەیشتنە بەهیواو سەرکەوتنە بەسەر دوژمناندا بۆیەکێك ببێت بەخاوەنی.

*ئەگەر خەوبینەر کەوتە نێو تۆڕێك یان بۆسەیەك ترسی زیندانو نەخۆشیو هاوسەریدەبێت.

**تۆرنەچی**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: تۆرنەچی پیاوێکە لەگەڵ کۆمەڵە پیاوێکدا دەجەنگێ دووڕوونو مامەڵەکەیان دەدزێت.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی تۆرنەچی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شەڕو ئاژاوەو سەفەری ئاسانو خۆش یاخود هاوسەرگیریو زۆری وەچەو نەوە.

**تۆڕی راوکردن:** (نابلسی) دەڵێت:
لەخەودا فڕوفێڵ و دەستبڕینە. ئەگەر بینی کەوتە تۆڕەوە دەکەوێتە بەردەم فڕوفێڵ. ئەگەر تۆڕی هەڵداو ئاژەڵ یا باڵندەیەکی راوکرد رزق و رۆزی بەفڕوفێڵ دەستدەکەوێت.

**تۆو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەر تۆوێك بەزەویدا بچێنرێ کوڕەو دەبێت بدرێتە پاڵ ئەو جۆرە، ئەو تۆو دانەوێڵانەی لەجێی دەرمانن پەڕاوی لەخواترسی و زوهدی تێدایە.

(نابلسی)دەڵێت: تۆو لەخەودا وەچەی چاك و باشە، تۆوی خەیارو کولەکەو کاڵەك رەواندنەوەی خەم و پەژارەیەو قوتاربوونە لەنەخۆشی، تۆوی باینجان و سلق و پیاز رزق و رۆزییە لەکێڵگەکانی.

*تۆوی ڕێحانە بۆنەخۆش و لەش بەبار بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا نەخۆشی و دینارە، ئەگەر کۆیکردەوە ژنەکەی نەخۆشدەکەوێ و دینارو پارەی زۆریشی دەستگیردەبێ.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵێکی زیادەیە ئەوەی ببینێ تۆوی لێدەچۆڕێت بۆیدەردەکەوێ.

*ئەگەربینی هاوسەرەکەی پیسدەکات جل و بەرگ یان خشڵ و زێڕی پێدەدات.

*ئەگەر مەنی کەسی تری بینی ماڵ و سامانی لەکەسێکەوە پێدەگات.

*کوپەیەك مەنی گەنجینەیە بەدەستی دەهێنێت، ئەگەر بەمەنی ژنێکی پیسکرد سوودی لێوەر دەگرێ.

*هاتنەدەرەوەی ئاوی زەرد لەزێی ژن بەڵگەیە لەسەرئەوەی منداڵێکی نەخۆشی دەبێت ، ئەگەر ئاوێکی سوور لەزێی هاتەدەرەوە منداڵێکی تەمەن کورتی دەبێت ، ئەگەر ئاوی رەش هاتە دەرەوە منداڵێکی دەبێت کاروباری خانەوادەکەی دەبات بەڕێوە، ئەگەر لەزێی ئاگر هاتە دەرەوە کوڕەکەی دەستەلاتدارێکی ستەمکار دەبێ.

*ئەگەربینی ماسیەك لەزێی دێتە دەرەوەو دووگیانیشبوو کوڕێکی تەمەندرێژی دەبێت یان تەمەن کورت.

*ئەگەر پیاوێك بینی خولی مانگانەی ژنان هاتوە بەسەریا دەچێتە لای مەحرەمێکی.

(نابلسی)دەڵێت: مەنی ژنی شۆخ و شەنگ قەڵەوی یان هەنگوینە.

*دەگونجێت مەنی بەڵگەبێت لەسەر هەموو ئاوێك بۆیەکێك بیخواتەوە یان بیگرێتە خۆی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چڵم.

*هەندێکدەڵێت: مەنی هیواو ئاواتە، ئەگەربینی مەنی لەئامرازی نێرینەی هاتە دەرەوە دەگات بەخوازو ئاواتی خۆی، ئەگەر مەنی لێڕۆیی خوازیاری بەدەستیدەهێنێ.

*دەگونجێت هاتنەدەرەوەی مەنی بەڵگەبێت لەسەر پشوو یان ڕۆچوون لەماڵو ساماندا یان بڵاوکردنەوەی نهێنی یان مردنی منداڵو پوچەڵکردنەوەی هاوسەرگیری. ئەگەر خەوبینەر لەوانەبوو کەچارەسەری کشتوکاڵیدەکرد زەوی مردوو زیندوو دەکاتەوە.

**تۆوچاندن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: چاندنی تۆو لەزەویدا بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستیو تەبایی. ئەوەی ببینێ تۆو دەچێنێو پیایدا نووسا پلەوپایەو شکۆمەندیو ڕێزداری بەدەستدەهێنێت. ئەگەر پیایدا نەنووسا خەمو پەژارە ڕووی تێدەکات.

(نابلسی) دەڵێت: تۆوکردنی شتێك کەتۆونەکرێ لەخەودا یان لەشوێنو جێگەی ناشیاو بەڵگەیە لەسەر زیادەڕەوی.

*دەگونجێت تۆو بەڵگەبێت لەسەر فراوانی ڕزقو ڕۆزیو زانستی بەرفراوانو شارەزابوون لەپیشەسازی.

*دەگونجێت بەڵگە بێت لەسەر تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکی شەڕەنگێزو خراپ.

**تۆوی پاقلە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی خەفەتبارە، ئەگەربینی لەبێستانەکەیدا پاقلەی کۆکردەوە لەژنانی خزمیەوە ڕووبەڕووی شەڕو ئاژاوە دەبێتەوە.

*پاقلەی وشك ماڵێکە ماڵو سامانی تری پێچاکدەکرێ، هەندێك پاقلە بەغەمو پەژارە دادەنێن.

## تە

**تەباهیجە**[1]**:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی بەو چەشنە گۆشت ئامادەی خواردن دەکاتو خەڵکی بانگدەکات بۆ خواردنی لەبەگژاچوونی مرۆڤێکدا پەنا بەکەسێکیتر دەگرێ کەبانگیکردوە.

*ئەگەر بینی دەرخواردی خەڵکیدەدات ماڵو سامان لەبازرگانی یاخود فێربوونی پیشەیەکدا خەرجدەکات.

**تەپڵ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەنگی تەپڵ دەنگێکی پووچو بەتاڵە، ئەگەر هاوارو سەماو مۆسیقای لەگەڵدابوو بەڵاو نەهامەتییە.

[1] **تەباهجە:** جۆرێکە لەسوورکردنەوەی گۆشت.

(وەرگێڕ)

تەپڵــــژەن پیـــاوێکی بێکـــارەو شانازیدەکات بەبێکارییەوە.
*تــەپڵ پیـاوێکی زللەوەشـێنە، ئەگـەر بینی بوە بە تەپڵ زللە دەوەشێنێ.
*تــەپڵی نێرەمـووك ژنێکـی عەیبـدارە رقـی دەبێـت لـەوەی دانـی پێـدابنێ چـــونکە ئابڕوچـــوونە ئەگـــەر بەدەربکەوێت.
*تەپڵی ژنان بازرگانیەکی کـەم سوودو بەزیانە لەشتی پڕوپووچدا.
*دەنگی تـەپڵی دەستەکۆمەڵ هـەواڵی درۆیە، دڕانی چەرمی تەپڵی فەرمانڕەوا مەرگی خاوەن هەواڵە.
*هـەروەها دەڵـێن: تـەپڵی دەسـتەیی پیـاوێکی ستایـشکاری پـەروەردگارە لەهـەموو حـاڵو بارێکـدا یـان بەڵگەیە لەسەر لەخۆباییبوونو کاسەلێسی.
(نابلـسی) دەڵێت: لەخـەودا هـەواڵێکی پـووچو بەتاڵـە، تەپڵـژەن بـەپیاوێکی فێڵبـــازو دەویـــت یـــان مـــەیفرۆش گوزارشتی لێدەکرێ.
*تـەپڵی حاجیـان لەکارواندا پیـاوێکی ڕێنیـشاندەرەو تـەپڵی جـەنگاوەرانیش بەو شێوەیەیە.
**تەپڵـژەن:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: دەستەڵاتدارێکی مەترسیدارە.
(نابلـسی) دەڵێـت: بینینـی لەخـەودا بەڵگەیە لەسـەر هـەواڵگر، دەگونجێت بەڵگـــەبێت لەســـەر نەخۆشـــیەك لەریخۆڵەدا پەیداببێت.
*تەپڵـــژەن بەپاشـــی مـــرۆڤ لێکدەدرێتـەوە، ئەگـەر تەپڵـژەنێکی بینی پاشێك دەبینێ.
*هـەروەها دەڵـێن: خـاوەنی هـەواڵی پووچو بەتاڵە.
*هـەروەها دەڵـێن: دەویتـە چـونکە خـەڵکی لەسـەر کـاری پـووچو بـەتاڵ کۆدەکاتەوە.
**تــەپو تــۆز:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بینینـی تـەپو تـۆز بەڵگەیـە لەسـەر سـەفەر، هـەروەها دەڵـێن: ئەگـەر هەورەبروسکەو گرمەوناڵەی لەگەڵدابوو بەڵگەیـە لەسـەر نـەبوونیو ناڕەحـەتی بەبەڵگـەی ئایـەتی: ﴿ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ (٤٠) تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ(٤١)] (عـــبس) ئەگـــەر لەگەڵیدانـــەبوو بەڵگەیـــە لەســـەر بەدەســـتهێنانی گـــەنجو دەســـتکەوت بـەپێی ئایـەتی: ﴿ فَأَثَرْنَ بِهِ نَقْعًا ] (العاديات: ٤).
*خـــاك داراییـــەو تـــەپو تـــۆزی لێدروستدەبێ.

*ئەگەر تەپو تۆزی بەسەرەوە بینی سەفەر دەکات یان پشتگیریو کۆمەك دەکریٚ لەجەنگدا.
*ئەگەر سواری ئەسپێکبوو غارغارێنی پێوەکرد هەتا تەپو تۆز بڵاوبوەوە ناوبانگ دەردەکاتو لەخۆبایی بوونو سپڵەیی سەری تیادەباتو سەردەکات بەکاری ناحەقداو فیتنەو ئاشوب دەنێتەوە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر تەپەو تۆزی لەنێوان زەویو ئاسماندا بینی کاروبارێکی تێکەڵەو هیچ دەرچەو دەروازەیەکی نییە.
*ئەگەر دەستی تەکان یاخود جلو پۆشاکەکەی هەژار دەکەوێت یاخود ژینێکی دوورودرێژ بەسەردەبات.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا گوتەیەکی پووچو بەتاڵە بەپێی ئایەتی: ﴿فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُوراً ] (الفرقان:٢٣).

**تەپو تۆزاوییوونی قژ:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسە رەزیلی لەماڵو داراییدا، لەجەستەشدا هەروایە.

**تەخت** ( رووپا - لەوح ): (نابلسی) دەڵێت: بینینی( لوح المحفوظ) - تەختی پارێزراو - بەڵگەیە لەسەر داپۆشینی کردارەکان.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر مژدە بۆ یەکێك لەناڕەحەتیدابێتو چاکبوونەوەیە بۆ نەخۆش چونکە لەکەمو کوڕی پارێزراوە.
*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزی بۆ رژدو رەزیل بەهۆی دابەشکردنی رزقو رۆزی تێدا.
*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر پاراستنی زانیاریو ماڵوسامان بۆ خاوەنەکەی.
*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر هەموو ئەمانەتپارێزێك.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دڵنیابوون لەترسو بیم.
*ئەگەر پادشایەك بینی سنووری دەستەڵاتی فراواندەبیٚ یان گەنجینەیەکی گەورەی بۆ ئاوەڵا دەبیٚ.
*بینینی ئەو لەوحانەی بۆ (موسی) (سەلامی خوای لێبێت) دابەزی بەڵگەیە لەسەر:
+گەواهیدەر.
+پێشەوایان کەوابەستە دەبن پێوەیان.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئامۆژگاری.
*لەوحی تەختە کەتیایدا دەنووسریٚ بەڵگەیە لەسەر هاوسەرو کوڕو زەوی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دڵنیابوون لەترس‌و بیم یاخود زانیاری بۆ قوتابیان.

*هەموو رووپاو لەوحێك نووسینی تێدابێ بەڵگەیە لەسەر رێگری لەگوناهو تاوان.

*ئەگەر بینی رووپاو لەوحێکی لەئیمام سەند دەسەڵات‌و زانیاری‌و پێشەوایەتی دەستگیردەبێ، ئەوجا ئامۆژگاری دادەدات‌و دەبێت بەسۆزو بەزەیی.

*ئەگەر لەوحێکی ئاسنیبوو کورێکی زاناو خاوەن هێزەو خراپەو بەلاو نەهامەتی رووی تێناکات، ئەگەر ساف‌و دیاربوو ئاوادەبێ‌و دەگات بەهیواو ئاواتی خۆی‌و ملکەچ‌و سەرشۆڕنابێ.

*ئەگەر لەبەردبوو کورێکی دڵڕەقی دەبێ.

*ئەگەر لەمسبوو کورێکی دووڕوویدەبێ.

*ئەگەر لەقورقوشمبوو کورێکی نێرەموکی دەبێ، نوسینەکانیشی بەڵگەیە لەسەرمنداڵ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کورێکی ژیرو زیرەك، ئەوەی فێردەکرێ وەریدەگرێ‌و فێردەبێ.

*لەوح ئامۆژگارییە، ئەگەر لەلایەن دەستەڵاتدارەوەبوو هێزە بۆ یەکێك لەخەودا وەریبگرێ.

*لەوح بۆ دووگیان کوڕە.

**تەختەودار:** تەختەودار دووڕوویەکە لەئایندا، پیاوانێکیشە دووڕوویان تێدایە.

*دارو تەختەی تەڕ بەمنداڵ لێکدەدرێتەوە، بینی داریش بۆ یەکێك لەنێو کەشتیەکدابێت بەڵگەیەلەسەری.

*دارو تەختەی وشك دووڕوییە، خوداوەند دەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ﴾ (المنافقون: ٤)

*پیاوێك لەخەودا بینی پەلێك بەدەستی راستیەوەیەتی‌و دارێکیش بەدەستی چەپی‌و دەیەوێت راستیان بکاتەوە، پەلەکە راست دەبێتەوە بەڵام دارەکە راست نابێتەوە، ئەم خەوەی بۆ راڤەکارێکی خەوگێڕایەوەو وتی: دووکورت هەیە یەکێکیان لەکەنیزەکێکەو ئەوی تریان لەئافرەتێکی ئازاد، پەروەردەی هەردووکیان دادەدەیت‌و کوری کەنیزەکەکە رەوشت وەردەگرێ بەڵام کوری ژنە ئازادەکە ئامۆژگاری وەرناگرێت، حاڵی ئەوپیاوە بەم چەشنەبوو کەبۆی لێکدایەوە.

*پیاوێکیش لەخەودا ببینی جل‌وبەرگێکی لەدارو تەختە پۆشیوەو بەنێو دەریادا دەڕواتو ڕۆیشتنەکەی هێواشەو بەم پێیەش دەریاو تەختە بەڵگەیە لەسەر کەشتی.

**تەختەی شەترەنج:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دنیایەکە بەرزدەبێتەوەو دادەبەزێو هەندێك لەدنیادا دەژینو هەندێکی تریش دەمرنو ڕێگەی ڕاستو ڕەوانو لارو خوار دەردەکەوێو هەر لەدنیادا ڕاکردنو جەنگو ڕقو قینو فیتنەو ئاشوبو دەوڵەمەندیو هەژاری بەدەردەکەوێ.

**تەرخوون:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: تەرخوون پیاوێکی بنەڕەتو ڕەچەڵەك خراپە.

(نابلسی) دەڵێت: پیاوێکی عەجەمییەو فێری خواناسیبوە لەخواناسانەوە هەتا لەسەر بنەڕەتو ڕەچەڵەکی خۆی گیرساوەتەوە.

*تەرخوون لەخەودا ناپاکییە.

**تەرزە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر لەشوێنو جێگەی کشتوکاڵبوو هیچ تێکناچێتو زیان بەکەس ناگەیەنێتو فەڕوخێرە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گەزۆو کوللەیەك زیان بگەیەنێت یان لەسەر پشیلەو چۆلەکە.

*هەروەها بەفریش هەمان سوودی هەیەو بەروبوومو پارەو سوودە.

*ئەگەر تەرزەکە زیانی گەیاند بەکشتوکاڵ یان بەخەڵکیو ماڵو حاڵیان کارەساتو مەینەت ڕوولەخەڵکی دەکات یاخود ئاوڵەو نەخۆشیەك کۆدەبێتەوەو پاشان دەتوێتەوە.

*ئەوەی ببینێ تەرزە هەڵدەگرێت لەجلو بەرگو هێڵەك یان شتێك کەئاوی تیا هەڵنەگیرێ ئەگەر دەوڵەمەندبوو کارو پیشەکەی نامێنێ، ئەگەر خاوەن شتومەكو کاڵابوو لەدەریادا ترسی لێدەنیشێ شتەکانی غەرق ببێ، ئەگەر هەژاریشبوو بەری ڕەنجی کۆدەکاتەوەو سوودی لێوەر دەگرێو بۆ داهاتوو ڕۆژانی داهاتووی پاشەکەوت ناکات.

*هەندێك دەڵێن: بەفری زۆر سزادانی فەرمانڕەوایە بۆ ژێردەستەکانیو قسەو جنێوی ناشیرینە بۆیان.

*ئەوەی ببینێ بەفر دەبارێ بەسەریا سەفەرێکی دووردەکات کەشوورەییو نەنگی دوادەکەوێت.

*بەفر غەمو پەژارەیە مەگەر کەمبێتو زاڵ نەبێتو لەشوێنی خۆی دابێت ئەگەر وابوو فەڕو بەرەکەتە بۆ خەڵکی

ئەو شوێنە ئەگەر بەفرەکە زۆربوو نەدەتوانرا بمالرێ دەبێت بەسزاو دەکەوێت بەسەر خەلکی ئەو شوێنەدا.

*ئەوەی سەرمای بەفر لەزستان یان هاویندا لێی بدات هەژاری رووی تێدەکات.

*ئەوەی بەفرێکی کلۆرو چاڵ بکرێت لەهاویندا ماڵێکی زۆری دەستدەکەوێتو لێی دەحەسێتەوەو غەمو پەژارە لەشوێنی ئەو بەفرە قوتار دەبێت.

*ئەگەر بەفرەکە توایەوە بەخێرایی خەمو پەژارە رووی تێدەکات بەلام بەخێرایی دەرەوێتەوە.

*ئەگەر بینی زەوی بەکشتوکاڵ داپۆشرابوو بەلام وشکو بەسترابوو وەك باران وایەو بەرحمەتو فەڕ دادەنرێت.

*ئەوەی لەشو لاری ببەستیو پارێزراوبێت قورس نابێت لەسەریو ترس رووی تێناکات.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی بەفر بکەوێت بەسەریا دوژمنەکەی زاڵدەبێت بەسەریا، ئەوەشی بەکەمی سەرمای بێت سامانو دوروەرجانی دەستدەکەوێت.

*هەروەها دەلێن: ئەگەر بەفر باری لەئاسمانەوە سزایە لەفەرمانڕەواوە بۆ خەڵکیو زەوتکردنی ماڵو داراییانە، خەوتنیش لەسەر بەفر بەلگەیە لەسەر پابەندبوون.

*ئەوەی ببینێ بەفر دایدەپۆشێ خەمو پەژارە زاڵدەبێت بەسەریا، ئەگەر بەفرەکە توایەوە خەمو پەژارەکەش دەرەوێتەوە.

*ئەوەی ببینێ بەفر دایپۆشیوە غەمو پەژارە زاڵدەبێت بەسەریا ، ئەگەر توایەوە غەمو پەژارە دەرەوێتەوە.

*کلۆربوونیش هەژارییەو سەهۆلیش خەمو پەژارەیە مەگەر ببینێ ئاوێك لەدەفرێکدابێتو ببەستێ ، ئەمەش بەلگەیە لەسەر تیاچوونی ماڵێك کەمابێتەوە، بەفرگریش گەنجینەی ماڵی فەرمانڕەوایە.

(نابلسی)دەلێت: ئەگەر بینی وەك ئەوەی ئاسمان لەبری باران بەفر یان سەهۆڵ ببارێنێ لەکاتێکدا گونجاوو کاتی خۆی نییە خەوبین بەهێواشی نەخۆشدەکەوێتو پاشان چاکدەبێتەوە.

*ئەگەر بینی تەرزە لەئاسمانەوە هاتەخوارەوە بەسەر لەشو لاریا بەشێك لەماڵەكەی تیادەچێت.

*بەفریش لەكاتی خۆیدا بەڵگەیە لەسەر رەوینەوەی خەمو پەژارەو، ناچاركردنی بەخیلو ئێرەییبەر چونكە ساردی تێدایە بۆئەو زەویەی مارو دووپشكی هەیە.

*ئەگەر سەرماكە زۆربوو ئەو شوێنە تێكدەداتو رێگەی بژێویو ژیان دەگرێتو سەفەر ئەستەمو مەحاڵدەبێت.

*دەگونجێت تەرزە بەڵگەبێت لەسەر بازرگانی سەیرو سەمەرەو ئەگەر خەڵكی لەدەفری خۆیاندا كۆیانكردەوە زیانیان پێناگات.

*ئەوی ببینێ تەرزە لەزەوییەكدا دەبارێت سۆزو رەحمەتی خواییە، وەگەرنا سزای خواییەو دادەبەزێت بەسەر خەڵكی ئەو ناوچەیەدا.

**تەرسی ئەسپ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵی پیاوێكی رێزدارە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی گسكی لێدەدات ماڵو سامان لەپیاوێكی رێزدارەوە بەدەستدەهێنێت.

*پشقلی بزنیش ماڵی پیاوێكی رێزدارە.

**تەرم(مەیت):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: هەندێكدەڵێت: تەرم پیاوێكە لەسەر دەستی كۆمەڵێك تیادەچن، ئەگەربینی پاڵخراوەو كەس هەڵیناگرێت زیندانی دەكرێت.

*ئەگەربینی بەرزكراوەتەوە دوای دەستەلاتدارێك دەكەوێتو سوودی ماڵو دارایی لێوەردەگرێت.

*ئەگەربینی تەرمەی بەرزكراوەتەوەو بەسەرشانی پیاوانەوەیە دەستەلاتو پلەوپایەی بەرز بەدەستدەهێنێتو گەردنی خەڵكی كەچدەكاتو بەپێی دەستەلاتەكەی ملكەچو رامدەبن بۆی یا بەئەندازەی ئەوانەی بەشداری لەئەسپەردەكردنی تەرمەكەیدا دەكەن.

*ئەگەربینی بەدوای تەرمەكەیدا دەگرین چارەنووسی بەخێر كۆتایی دێت، هەروەها بەهەمان شێوە دەبێت ئەگەر بەشانو باڵیدا هەڵیانداو دوعای خێریان بۆ كرد.

*ئەگەربینی زەمیانكردو خراپەیان وت چارەنووسی بەباش ناگەڕێت.

*ئەگەر خۆشی دوای تەرمەكەی خۆی كەوت شوێنی فەرمانڕەوایەكی خراپ دەكەوێت.

*ئەگەر تەرمێكی بینی لەبازاڕداو هەڵیانگرت بۆ گۆڕستانێكی دیارو

ناســـراو حـــەق‌و مافێکـــە دەگـــات بەخاوەنەکانی.

*ئەگـەر تـەرمێکی بینـی بـەنێو هـەوادا دەڕوات پیـاوێکی بـەناوبانگ لـەوڵاتی غەریبی دەمرێت یـان زانـاو شـارەزایەك دەمرێـــت حاڵ‌وبـــاری لای خـــەڵکی ئاشکراو دیارنەبووە.

*ئەگـــەر لەســـەر دارەمـــەیت خـــۆی بینیەوە بەسەرزەویدا دەڕوات‌و سـواری کەشتی دەبێت.

*ئەگـە کۆمەڵـە تـەرم‌و جەنازەیـەکی زۆری بینـــی لەشـــوێن‌و جێگەیەکـــدا دانراون جێنشیانی ئـەو شوێنە گونـاهو تاوان ئەنجام دەدەن.

*ئەگـەر ژنێـك بینـی مـردووەو لەسـەر دارەمەیت هەڵیانگرتوە ، ئەگەر مێـردی نەبوو شـوودەکات ، ئەگـەر مێردداربـوو ئاینی تێکدەچێت.

*ئەگـەربینی مردوویـەکی هـەڵگرتووە مـــاڵێکی حـــەرامی دەســـتدەکەوێت، هـــەروەها ئەگـــەر مردوویەکیـــشی بەکێشکرد بەسەر زەویدا مـاڵ‌و دارایـی حەرامی دەست دەکەوێت.

(نابلـسی)دەڵێـت: ئەگـەربینی نوێـژ لەسـەر تـەرمی مـردوو دەکـات برایـەتی دەخاتە نێوان کۆمەڵێك لەبەر خوا.

*هــەروەها وتــراوە: تــەرمی مــردوو پیــاوێکی دووڕووەو لەســەر دەســتی ئەودا کۆمەڵ‌و گروهێك تیادەچن.

*ئەگـــەربینی لەســـەر دارەمەیتـــە ماڵ‌ودارایی زیاد دەکات.

*ئەگــەر تــەرمی مردوویــەکی بینــی لــەبازاڕدا خراپــی کــاڵاو شــتومەکی بازاڕە.

*هـــەڵگرتن لەدارمەیتـــدا پلەوپایـــەو سەفەرە بەدەریاو وشکانیدا.

*ئەگەربینی تەرمێك ئەسپەردە دەکات بەڵگەیە لەسەر خواحافیزی لەگەشتیارو ســەفەرکارێك یــان ئــەوەی هـــەوڵی شـوودەدات بـۆ خـۆی بـەهۆی ئـەوەی مـــردوو بەڵگەیەلەســـەری چـــونکە ئەسپەردەکاری مردوو بەخاك پاداشتی دەســـتگیر دەبێـــت لەهـــەڵگرتن‌و ئەسـپەردەکردنی‌و بەتـەنیا خوداوەنـد دەزانێت ئەو پاداشتە بەچ رادەیەکە.

**تەرەفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: خـاوەن ماڵێکی خۆش‌و باشە.

**تەڕی(شیٚ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: شیٚ بەڵگەیـە لەسـەر قورســی‌و گرانــی‌و نەتوانینی ئەنجامدانی کاروپیشە.

**تــەزبیح:** (نابلـسی)دەڵێـت: لەخـەودا ژنێکی چاك‌و باشـە یـاخود بژێوییـەکی حـەلاڵ یـان سـەربازی بەسـوودە بـۆ

یەکێك ببێت بەخاوەنی یان زیکرو یادی خوداوەندی پێبکات.

**تەشت:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کچ یان خزمەتکارە ، ئەگەر بینی تەشتێکی مسی بەکارهێنا کچێکی تورکی دەهێنێ، ئەگەر تەشتەکە لەزیوبوو کچێکی رۆمی، ئەگەر لەزێڕبوو ژنێکی شۆخو شەنگو جوان داوایەکی لێدەکات ناتوانێت بچێتە ژێری.

* هەروەها دەڵێن: تەشت ژنێکی مۆچیاریدەر مێردەکەی رێنومایی دەکات بۆ پاکیو رێبازی خوایی.

* ئەگەر بینی تەشتێکی ئاڵتوون یان سینیو چاپەز یا گۆزەیەكو هۆکارێکی هەبێت ئەوە خزمەتکارەو دەیگرێ یان ژنیکە دەیکات بەهاوسەری خۆی یاخود کچێکی رەوشت نزمو سووکە.

* هەندێکدەڵێن: ئەگەر بینی قاپی زێڕو زیو بەکاردەهێنێ ئەوە کردارو گوناه ئەنجامیدەدات، ئەگەر هەریەك لەوانە بەمردوەوە بینرا مژدەیە بەپێی وتەی پەروەردگار: ﴿ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ ﴾(الزخرف: ٧١).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر تەشتێکی لەخەودا کڕی ئەوە کچێك دەهێنێت.

* تەشت شکۆمەندیو بەرزیو رزقو رۆزیو ماڵو سامانە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: تەشت بەڵگەیە لەسەر ژنو خزمەتکارو ئەو شوێنەی تێیدا دەژیو رزقو رۆزی رووی تێدەکات.

* ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێکی بینی لەسەر تەشتێکی گەورە کۆبوونەتەوە یان لەگەنێکی ئێجگار گەورە ئەگەر خەڵکی گوندنشینبوو زەویوزارو کێڵگەکانیانە، ئەگەر جەنگاوەربوون بەدووروویی دەچن بۆیو دەستیان بەفرۆفێڵ دەجووڵێن بەپێی خواردنو گەوهەری کارەکە.

* ئەگەر زانستپەروەربن کۆدەبنەوە لەدەوری ئەگەر خواردنێکی خۆشو بەتام بێت، ئەگەر خراپەکاربێ یاخود خواردنەکەیان ماسی یا گۆشتێکی بۆگەن بێت دەچنە لای ژنێکی داوێنپیس.

(نابلسی) دەڵێت: تەشتو لەگەنێك ئەگەر لەدار دروستکرابوو دنیایە لەگەڵ ئەوەی لەسەفەردا بەسەریا دێت، ئەگەر لەشووشەبوو دنیایە لەنیشتماندا.

* لەگەنو تەشت بەڵگەیە لەسەر حاڵو باری رێکخستنی بژێوی مرۆڤ.

* ئەگەر بینی تەشتو لەگەنێك دەلێسێتەوە بەپەنجەی رزقو رۆزی تیادەچێتو ئەجەلو وادەی نزیکدەبێتەوە.

**تەشتگەر:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دەڵاڵی ژنان و پێشەنگیان هەروەها دروستکاری کوپارەو گۆزەش هەر بەوچەشنەیە.

**تەشی( خەرەك ):** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر ژنێك بینی تەشیەکی بەدەستهێنا کچێك یان خوشکێکی دەبێت، ئەگەربینی پچڕاو کەسێکی لەسەفەردابوو لەسەفەرەکەی دەمێنێتەوە ، ئەگەر بەتەشیەکە رستی پەنادەبات بۆ پیاوێکی ئاوارەو نەوازە.

*تەشی بەڵگەیە لەسەر نوێنەرو کۆکەرەوەی ماڵ‌وسامان یاخود ئوتومبیل و ئاژەڵێك پێداویستی بەجێبهێنێت

**تەشی رێس:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی ژنی تەشی رێس بەڵگەیە لەسەر قەناعەت و شوێنکەوتنی سوننەت لەگەڵ بەستنی رایەڵەی کاروبارەکان و خۆ یەلاکییکردنەوە بۆ خێرو چاکە، ئەگەر ژنێك دەیرێساو دەیچڕی بەڵگەیە لەسەر خەشم و قینی خوایی لێی و داباریینی سزای خودا بەسەریا.

**تەلەفۆن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر گوێی لەدەنگێکبوو لەتەفۆن یان هەر دەنگێکیتر دەچوو فەرمان و رێگریو مژدەو ئاگاداری لەخۆگرتبوو بەو چەشنەیە کەدەیبیستێ بەبێ لێکدانەوە.

**تەلاق( جیابوونەوە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینینی ژنەکەی تەلاقدا دەوڵەمەند دەبێ بەپێی ئایەتی: ﴿وَإِنْ يَتَفَرَّقَا يُغْنِ اللهُ كُلًّا مِنْ سَعَتِهِ﴾ (النساء: ١٣٠).

*هەروەها دەڵێن: ئەو خەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خاوەنەکەی لەدەستەڵاتدارێك جیا دەبێتەوە کەپێشتر تێکەڵیبوە.

*تەلاقدانی ژن بۆ دەستەڵاتدار لابردنیەتی و بۆ پیشەوەریش وازهێنانە لەپیشەکەی، ئەگەر تەلاقی (رجعی)بوو دەگەڕێتەوە بۆ پیشەو کارەکەی.

(نابلسی) دەڵێت: تەلاقدان بۆ رەبەن وازهێنان و جیابوونەوەیە لەوەی کەلەسەریەتی لەخێر یان شەڕ.

*تەلاقی هاوسەردار پوچەڵبوونەوەی بژێوی یان مەرگێتی بەتایبەت ئەگەر نەخۆشبوو سێبەسێ نەگەڕانەوەی ئەو کەسەیە بۆسەر ئەوحاڵەی کەلەسەریبوە، بەلاَم یەك تەلاق گەڕانەوەیە بۆئەوەی لەسەریەتی، ئەگەر تەلاقی (بائن)یدا واز لەپیشەکەی دەهێنێت و نایەوێت بگەڕێتەوە بۆی.

*ئەگەر تەلاقیداو سێ خولی مانگانەی بەسەرا تێپەڕیبوو واز لەپیشەکەی دەهێنێت دوای ئەوەی پێویستی پێنابێت، هەروەها دەڵێن: لەدەستەڵاتدەخرێ.

*تەلاق بەڵگەیە لەسەر هەژاری چونکە ژن دەستەڵاتو شانو شەوکەتی پیاوو دنیایەتی، ئەگەر ژنێکی نەخۆشی هەبوو بینی تەلاقیدەدات بەیەکجاریی دەمرێت ، هەروەها ئەگەر فرۆشتی یان ئازادیکرد، بەلاّم ئەگەر تەلاقی گەڕانەوەیدا چاکدەبێتەوە.

**تەماشاکردنی عەورەت:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی سەیری زێی ژنەکەی دەکات یان زێی ژنانیتر بەئارەزوەوە یاخود دەستی لێدا بازرگانیەکی خراپ ئەنجامدەدات.

*ئەگەر بینی سەیری ژنێکی رووت دەکات بەبێ ئەوەی خۆی ئاگای لێبێت کەوتنەنێو هەڵەو پێهەڵخلیسکانە.

**تەمومژ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: تەمومژ تێکەڵبوونو فیتنەو سەرسامییە روو لەخەڵکدەکات.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا تێکەڵبوونی کاروبارەکانی ئاینو دنیایە، ئەوەی تەمومژێك ببینێ دێتەخوارەوە بەسەریا خوازیاری ناحەقییە .

**تەنوری نان:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی تەنورێك دروستدەکاتو خۆشی شایستەی پلەوپایەو دەستەڵاتبوو لەدوژمنانی قوتاردەبێت ئەگەر دومنداربێت، ئەوەی بچێتەسەر تەنورێکی بێئاگر ئەوا ژنێکی بێخێرو چاکە دەبێت بەهاوسەری.

(نابلسی)دەڵێت: ئەوەی لەخەودا ببینێ تەنورێك دادەخات سوودو قازانج بەدەستدەهێنێت لەماڵو دارایی و نەفسی خۆیدا.

*ئەگەر لەماڵی پادشاو فەرمانڕەوا تەنورێکی بینی ئەوا ئەگەر کاروبارێکی تێکەڵوپێکەڵی هەبوو رێنوێنی دەکرێت بۆچاکە تێیدا.

*ئەگەر دوژمنداربوو سەرکەوتوو دەبێت بەسەریاندا.

*تەنوریش چەن جۆرێکی هەیەو هەرجۆرە لێکدانەوەیەك هەڵدەگرێ:

+**<u>تەنوری برژاندن</u>:** بەڵگەیە لەسەر زیندانی بۆیەکێك لەنارەحەتیدابێتو قوتار دەبێتو بەخۆشیادەکەوێت.

+**<u>تەنوری گۆشتی توێ تویکراو</u>:** بەڵگەیە لەسەر پێشەوای دادپەروەر کێشەو پرسیار دەچێتە بەردەستیو، فەرمانی دروستو لێکدانەوەی باشدەدات بەهەریەکێك.

*ئەگەر بینی تەنورێکی هەیە لەزستانداو خۆی گەرمدەکاتەوە، ئەگەر لەهاویندابوو بەڵگەیە لەسەر نەخۆشکەوتنی بەهۆی گەرماوەو خوێنی بەلێشاو لەبەر دەڕواتو غەمو پەژارەش زاڵدەبێت بەسەریا.
*دەگونجێت تەنور بەڵگەبێت لەسەر گەدە هەموو خواردنێك دەگرێتەخۆو دەیهاڕێ.
**تەنەکەچی( تەنەکەساز)**:(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پەروەردەکارو وێنەگر.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر درۆزن لەرەفتارو گوتەدا.
**تەواف( سوڕانەوە )**:(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئامۆژگاریدەرێك خێری خۆیدەکاتو شەڕو خراپەی لەخەڵکی دەگرێتەوە.
**تەوبەکردن**:(ئیبن سیرین)دەڵێت: تەوبە بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی موڵكو دەستەڵاتو بەرەکەتو رێزداری، دوای ئارامگرتن لەسەر بەڵاو نەهامەتی.
(نابلسی)دەڵێت: تەوبەکردن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رزگاربوون لەزیندان، ئەگەر بینی لەخەویا واز لەخراپەکاری دەهێنێت بەڵاو نەهامەتی رووی تێدەکاتو تاقیدەکرێتەوە پێی ، پاشان تەوبە دەکاتو دەبێت بەخاوەن موڵكو دەستەڵاتو رێزداری بەدەستدەهێنێت، ئەوەشی تەوبە بکات لەخەودا لەگوناهو تاوانێك نەیزانیبێت چییە بەڵام بترسێ لەوەی بکەوێتە نێوی دەرەنجامەکەی بەخێر کۆتایی دێت ، تەوبەکردن بۆ بێباوەڕ موسوڵمانبوونیەتی، تەوبەش بۆ گۆرانیبێژو هاوچەشنەکانیان بەڵگەیە لەسەر هەژارکەوتن دوای دەوڵەمەندی.
**تەور**:(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگر تەورێکی زیوی لەدەستدابوو برازاکەی خۆی دەهێنێ بۆ کوڕەکەی.
*ئەگەر لەنقێم یا مورووبوو براکانی تووشی غەمو پەژارە دەبن بەدوای یەکدا.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر خشڵی بەخۆوەبینی پیاوێکی خاوەن بژێوییە، ئەگەر تەورەکە لەگەڵ خشڵدابوو گەواهیدان بەدەستدەهێنێ.
**تەورات**:(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی (تەورات)دەخوێنێو نەیزانی کەسێکە هەمان رێبازو بۆچوونی قەدەریەو جەبریەکانی هەیە.
*ئەگەر (تەورات)ی هەبوو گەر پادشایەکی موسڵمانبوو ولاتی یەکێك

لەدوژمنەکانی ئازاد دەکات یاخود رێدەکەوێت لەگەڵیان لەسەر ئەوەی کەدەیەوێت ،گەر زانابوو زانیاری زیاد دەکات یان بیدعە لەو زانیارییەی دەیزانی دروستدەکات ، یا هەمان رێبازی ئارەزووبازان دەگرێتەبەر.

*ئەگەر خەوبینەر رەبەنبوو لەنەتەوەیەکی جیاواز لەنەتەوەکەی خۆی ژندەهێنێت یا سەفەر زۆر دەکات.

*دەگونجێت بینینی (تەورات) بەڵگەبێت لەسەر بەدیدارشادبوونی کەسانی غەریب یان دۆزینەوەی شتی ونبوو.

*ئەگەر ژنەکەی دووگیانبوو کورێکی هاوچەشنی خۆی دەبێت ، هەروەها حوکمی کتێبی تریش وایە.

*دەگونجێت ژنێك مارەببڕێت بەبێ ئامادەبوونی بەرپرسی یان لەوانەیە تێکەڵ بەوانەببێت کەئاینەکەی تێکدەدەن.

*ئەگەر هەرکتێبێکیتر بەدەر لە(قورئان)ی بینی وەك (صحف) بەڵگەیە لەسەر رێزو شکۆداریی.

*بینینی (تەورات)و (ئینجیل) بەڵگەیە لەسەر بینینی پێغەمبەر(ﷺ) گەرچی لەخەویشدابێت.

*هەروەها بینینی(تەورات)و (ئینجیل)بەڵگەیە لەسەر ناپاکیو پەیمانشکێنیو بەهانەگریی.

*بینینی (تەورات)بەڵگەیە لەسەر داناییو زانیارییو رێنومایی، ئەوەی ژنێکی دووگیانی هەبێتو بەدەستیەوە (تەورات) ببینێ ژنەکەی دووکچی دەبێت.

**تەوقەکردن:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجو پەیمانو پابەندبوون بەخێرەوە.

**تەون( دەستگای جۆلایی ):** (نابلسی)دەڵێت: ئامرازی چنینەو ئەگەر بینی بەڵگەیەلەسەر جموجووڵو سەفەر. تەونی راخراو بەڵگەیە لەسەر گرتن چونکە ژنان بەپێوە دەیچنن.

*تەون بەخشینو پاڵکەوتنە بۆ خاوەن پێداویستی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پلەوپایەی بەرزو بڵند.

*ئەگەر ژنێك ژنێکی تری بینی لەسەر ئامرازی تەونو دەریکردو خۆی کاری لەسەرکرد بەخێرایی دەمرێت.

**تەونکردن( چنین ):** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر پێچانەوەی کار یاخود بەسەرچوونی زوربەی رۆژەکان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر میانڕەوی حاڵو فراوانیو هاتنەوەیەکی دنیابێت.

*ئەگەر جلێکی چنی سەفەر دەکات، ئەگەر بینی دەیچنێ پاشان دەیبڕێ داواکەی گەیوەتە جێی داواکراو پاشان بچڕاوە، ئەگەر زیندانیکرابوو دەرووی لێدەکرێتەوە ، ئەگەر لەشەڕدابوو ئاشتەوایی ئەنجام دەدات.

*چنینی جلوبەرگ لەلۆکەو خوری یان موو ئاوریشم یاخود شتێکیتر وەك یەك وایە.

*ئەگەر جلێکی داواکراوی بینی سەفەر دەکات، ئەگەر جلی هەڵخست ئاوارەو موسافیرێکی دەگەڕێتەوە.

*ئەگەر جلێکی چنی لەمووی نەرمی ئاژەڵ فەرمانی خزمەتکارێکە ، دەگونجێت چنین بەڵگەبێت لەسەر جووت بوون.

**تەونکەر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: کۆمەڵێکی ماندوون هەوڵ بۆ شتێکدەدەن یاخود هەوڵی فێربوونی زانیاری دەدەن.

*دەگونجێت تەونکەر بەڵگەبێت لەسەر بینا دروستکردن لەسەر دیوار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چنەرو دانەرو چێنەر.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرنەوەی مرۆڤ تێدایە لەنەخۆشیو غەمو پەژارەو شەڕو ئاژاوەو نووسین. ئەگەر تەونکراوەکەی بڕی لەغەمو پەژارەو کارو سەفەری قوتار دەبێت، وەگەرنا ئەوەی بۆی دەمێنێتەوە بەئەندازەی خوازوویستی خۆیەتی.

*هەروەها وتراوە: سەفەرە یاخود شەڕو ئاژاوەو بەربەرەکانییە.

(نابلسی)دەڵێت: پیاوێکە زۆر سەفەر دەکاتو زۆریش ماندوودەبێت لەکارەکەیداو وەك تێکۆشەر وایە.

*ژنی تەونکەر بەڵگەیە لەسەرنەوەی تەونکەری پیاو بەڵگەیە لەسەری.

*ئەگەر پیاوێکی رەبەن بینی هاوسەرێکی ئازاد دەگرێ ، ئەگەر ژنێکی رەبەن بینی شوودەکات.

**تەویلە:** لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزیو سوودو قازانج.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵو لانەی خەوبینەر خانەوادەو خزمەتکارو تیرەو هۆزی کۆدەکاتەوە، یا ئەو بازاڕەی دەیگرێتەبەر بۆ سوودو قازانج یا زەوییەك بەئاژەڵەکانی دەیکێڵێو خوازیاری فەڕو خێرییەتی.

**تەیەموم:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی تەیەموم دەکات دەرووی لێدەکرێتەوەو قوتاربوونی نزیکە چونکە تەیەموم بەڵگەی دەرووی نزیکییە لەخوداوە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+دەروو قوتاربوون.

+سەفەریان ئاگاداریکردن بەتوشبوون بەنەخۆشی پێویستی بەتەیەموم دەبێت.

+دەستەکەوتنی ئاو بۆ گەشتیارو موسافیر.

*ئەگەر بەخۆڵ تەیەمومیکرد بەڵگەیە لەسەر نەگونجانی سەفەرو وەرگرتنی بەهانەو کارکردن بەویستی خۆ.

*تەیەموم بەڵگەیە لەسەر:

+هەژاری .

+نەخۆشکەوتنی لەش ساغ.

*تەیەموکردن لەگەڵ بوونی ئاویشدا بەڵگەیە لەسەرکاری پووچ و بەتاڵ.

*ئەگەربینی تەیەموم دەکات و ئاو نییە بەڵگەیە لەسەر نزیکی دەرووی خوایی و رەواندنەوەی غەم و پەژارە ، ئەگەر تەیەمومیکرد لەگەڵ بوونی ئاویشدا پێنج وتەی لەسەرە:

١)خەوبینەر گەرچی توانای هاوسەرگیری هەبێت بەڵام نایکات.

٢)لەوانەیە سەفەر بەوشکانیدا بکات لەرێی سەفەر بەئاودا.

٣)لەوانەیە ئاوتەخوازی لێخۆشبوون بێت گەرچی سووریش بێت لەسەر تاوان.

٤)لەو کەسانەیە دنیا زاڵدەکات بەسەر قیامەتدا.

٥)یاری بەئاینەکەی دەکات و بەهانە دەگرێ لەوتەی زانایان.

*هەروەها وتراوە: بەڵگەیە لەسەر قوتاربوون لەنەخۆشی و زیندانی.

## تی

**تیابردن( کوشتن )**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دەگونجێت جرجی زیانبەخش و دەردهەڵگربێت یان ئاگرێکی سووتێنەر یاخود لێشاوو لافاوێکی بەزیان یا گۆڕانی حاڵوباری جیهان و تیابردنی دوژمنانبێت.

**تیاچوون( فەوتان )**: (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا زانستپەروەرێك تیاچوو خەڵکی سوودو قازانج لەزانیارییەکەی وەردەگرن و ناوبانگدەردەکات.

*دەگونجێت فەوتان بەڵگەبێت لەسەر کەم بەختی.

*ئەگەر بینی هەندێك لەجل وبەرگەکەی یان ماڵەکەی تیاچوو هەندێك لەماڵ و داراییەکەی دەمێنێتەوەو نافەوتێ.

*ئەگەر بینی هەموو جلەکانی لێزەوتکرا بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی ئەو شەڕو خراپەیەی تووشی دەبێت.

**تیر( رم ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: تیر بەتەنیا گوڕ یا برایە، بریندارکردن بەتیر ناتەواوی‌و زەفەر پێبردنە.

*هەروەها دەڵێن: تیر گەواهی حەق‌و راستییە یاخود سەفەرە یان ژنە.

*ئەگەر تیرێك بەدەستییەوە ببینیّ کوڕێکی دەبێت، ئەگەر نووکی هەبوو کوڕەکەی دەبێت بەبەرپرسی خەڵکی.

*ئەگەر تیرێك بەدەستیەوە ببینیّ‌و سوارەبێت دەستەڵاتدارێکە لەشکۆمەندی‌و دەستەڵاتدایە.

*شکانی تیرێك بدرێتە پاڵ کوڕ یان برا نەخۆشییە لەکوڕو براکەیدەدات، ئەگەر شکاندنەکە چاکبوونەوەی هەڵدەگرت چاکدەبێتەوە، ئەگەر چاکبوونەوەی نەبوو مەرگی یەکێکە لەو دووانە.

*شکانی تیرو رم بۆ فەرمانڕەوا لەسەرکار لابردنیەتی.

*ونکردنی نێزەکەی مەرگی کوڕو برایە، رمی بچووکیش وەك هی درێژ وایە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا تیرێکم بەدەستەوەبینی لەکاتێکدا لەبەردەستی پێشەوایەکدا دەڕۆیشتم بەڕێوە، ئەویش وتی: ئەگەر خەوەکەت راستبیّ لەبەردەستی پێشەوادا گەواهیەکی راستیدەدەیت.

*دەگێڕنەوە (ئەباموخلەد) لەخەودا بینیویەتی تیرێکی زەدینی [1] پێدراو پاشان کوڕێکی دەبێت‌و ناوی دەنێت زەدینی.

*پیاوێك بینی چەقۆیەکی درێژ لەئاسمانەوە دەکەوێتە خوارەوە قاچێکی بریندارکرد، پاشان مارێك دای بەو قاچەیەوە.

*بریندارکردن بەتیر قسەیەکە گوتەبێژ بەرانبەری پیّ بریندار دەکات.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+دارو عەمود.

+ژنێکە یاخود کوڕ یان گەواهی حەق‌و راستییە.

+سەفەرە.

*ئەگەر رمەکە دەدرایە پاڵ دەستەڵاتدارێك‌و نکوولی لێکرد رووداوێك بەسەر ئەو دەستەڵاتدارەدا دێت‌و غەم‌و پەژارەو دزەکردنی دوژمن رووی تێدەکات.

*ئەگەر درایە پاڵ برایەك بەڵاونەهامەتییە، ئەمەش ئەگەر شکاو فڕێدراو نەیتوانی چاکیبکاتەوە، ئەگەر ئامادەیکرد پاش چاککردنەوەی

---

[1] **تیری زەدینی:** تیرێکە دەدرێتەپاڵ ئافرتێك لەراستکردنەوەی تیردا بەناوبانگبووە. (وەرگێڕ)

لەنەخۆشــی چـاکدەبێتەوە یـاخود خەریکـە لەکاریدەخـەن دواتـر خـۆی چاکدەکات.

*تـیرو رم برایــە یــان هاوڕێیــەو هاوەڵەکەیو دەستەڵاتی بەجێدەهێڵێ.

*ئەگـەر تیرێکـی بەدەسـتی خۆیـەوە بینیو بەنێو بازاڕدا دەڕۆیشت کـوڕێکی نێرینەی پێدەبەخشرێ، ئەگەر خستیە پـشت دەرگاکـەی بەدەسـت داپۆشـی ژنەکەی کچی دەبێت.

*تـیر بـەبێ ئاسـن کـچە بـۆ ئـافرەتی دووگیــان، رزقو رۆزییــە دوای کــچ ، هەروەها چەن کچێکی دی دێن بەدوایدا بەئەنـدازەی گرێـی تیرەکـە ئەگــەر خەوبینەر ئەژمەردەیکرد.

**ئەگەر دەستەڵاتدارێك ببینێ رمێکی دەداتــێ دەســـتەڵاتو پۆســـتێك وەردەگـرێ، ئەگــەر رمەکــە ئـاڵابوو دەستەڵاتدارییەو ناوبانگ پەیدادەکات.

*ئەگەر رمێکی هـەبێتو هاوسـەرەکەی دووگیـــان نـــەبێت هاوەڵایـــەتی مرۆڤێکدەکات بەرگری لێدەکات یاخود برایەك بەرگری لێدەکات لەدوژمنان.

*ئەگەر فەرمانڕەوایەك بینـی تیرەکـەی درێـژبوەو لەئەنـدازەی خـۆی دەرچـوە ستەم لەبەردەستەکانیدەکات.

*ئەگەر بینـی بـەرمێك کەسێك بریندار دەکـات خـوێنی لەبـەر دەڕوا کەسـێك بەکرێدەگرێ بۆ کارێکی ئـاوا، هـەروەها دەڵـێن: لەشـساغ دەبـێو مـاڵوداراییی زۆردەبێ، ئەگەر لەوێنەبوو بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە بۆلای خانەوادەکەی.

*ئەگــەر بینـــی بـــەرمێك کەســـێکی برینــدارکرد ئەگــەر بریندارکردنەکــەی تەڕبوو بەئەندازەی ئەو تەڕییە غەرامـە دەکـرێ، ئەگــەر تەڕنــەبوو کردارێکـی ناقۆڵای دەدرێتە پاڵ.

*ئەگەر بینـی بـەتیرێك بریـنداردەکرێو زامەکـــەی ســـەخت دەبـــێ بریـنــــدار ماڵوســامانێکی حــەرام لەبرینــدارکار وەردەگرێ ، ئەگەر رمەکە گۆشتی بڕی یاخود ئەندامێك لەئەندامەکانیو کەوتـە دەســتی بکــەرەوە لەبریندارکــەرەوە مـــاڵو خێرێکـــی خراپـــی لەئایـنـــدا دەسـتدەکەوێ، بـەڵام ئـەوەی ببینـێ کوشتاری دوژمن دەکات تـیرو رم مـاڵو داراییـــەکی حەرامـــەو بەدەســـتی دەهێنێت.

**تیرئەنـداز:** (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: پیاوێکی خواناسە.

*هەندێکدەڵێن: سیخوڕە.

**تیرساز( تیرهاویّژ ):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی یان توندو تیژیو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا.

*تیرساز پیاوێکە خەڵکی هاندەدات بۆ جیهادو تێکۆشان یاخود سەرۆکی سەربازو دەستەڵاتدارانە.

*هەروەها دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جەنگو شەڕو ئاژاوەو بەرەبەرکانی لەنووسراودا.

*بینینی بەڵگەیە لەسەر:

+رەخنەو نکوولی لێگرتن لەئابروو.

+بژێویو کاسبی حەرامو نادروست.

*ئەگەر لەنێوان خەوبینەرو یەکێکدا ئاژاوە بەرپابوو زاڵدەبێتو سەردەکەوێ بەسەر دوژمنانیدا.

*تیرساز وەك پادشاوایە لەفراوانی دەستەلاتو هانی بەردەستەکانیان دەدات یارمەتی یەکتر بدەن.

*تیرساز بەڵگەیە لەسەر:

+پەروەرشیارێکی چاکساز بۆ دووڕوانو کەسی لاروبەد.

+بەڵگەیەلەسەر بێژوو.

+نووسەر.

+پیاوی پەناوپشتگیرە بۆ هاوەڵەکانی.

**تیروڕمساز:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیشەو دژایەتیو جەنگو کەرتو پەرتی کۆمەڵو تێکەڵبوونی حەڵاڵ بەحەرامو خەرجیو سوودو بەجێهێنانی پێداویستیەکان.

**تیروکەوان:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر :

+نوێنەرو نووسین.

+هێزو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا.

*یەك تیری ئاوەژوو ئەگەر ژنێك بینی لەتیرەوانەکەیدا هەڵگەڕانەوەی مێردەکەیەتی بەسەریا.

*ئەگەر تیری بەدەستەوە بینی دەستەلاتو شکۆمەندیو ماڵوسامان بەدەستدەهێنێت.

*شکانی تیرێك لەکەوانەکەی دەربچێت نەتوانینیەتی لەبەجێگەیاندنی پەیامەکەیدا.

*تیر بۆ ژن مێردەکەیەتی.

*تیرهاویشتن وتەیە بەنامە دەنێردرێت.

*ئەگەر بینی تیرێکی هاویشتو نەیپێکا نوێنەرێك دەنێرێت بۆ مەبەستێكو بۆی بەجێنایەت.

*ئەگەر ژنێك یا کچێك تیرێکی تێگرتو دڵی پێکا گاڵتەو شۆخی لەگەڵدەکاتو وابەستەی دەبێت.

*ئەگەر تیری واژوکراوی بینی نوێنەری نەرمو نیانن لەگوتاریاندا.

*ئەگەر بینی تیرێکی هاویشتو پێکای ئەگەر منداڵبوو نێرینەدەبێت.

*تیری هەڵبەستراو نوێنەر یا رزقو رۆزی یا کوڕێکی سوننەتکراوە یاخود تەمەنێکی دووردرێژ یا جلوبەرگە.

**تیروٚك:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپەو بەدەستهێنانی پێداویستیو وەچەی چاکو ماڵوسامانی بەسوودو قازانج.

*بۆ رەبەن بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیریو دەرکەوتنی حەقو راستی.

*هەروەها پیاوێکە دوو شەریکی دووڕووی هەیەو، یەکێکیان دڵرەقەو جیاوازی ناکات لەنێوان حەقو راستیدا.

**تیرهاوێژ:** (نابلسی)دەڵێت: بەیەکێکدەڵێن تیر دروستبکات، بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر فروفێڵو چاوبەست بەهۆی ماڵوسامانەوە.

(نابلسی)دەڵێت: سیخوڕە فەرماندەکات بەدووزوبانی.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو وێرانەو بەشکردنی ماڵوسامانو فەرزی شەرعی.

**تیشكو رووناكی:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نوێنەر یان ئاڵاو بەیداخ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چەسپانو یارمەتی ئەوەی لەکاتی رووناکیدا ئەنجامیدەدات.

*دەگونجێت رووناکیو رۆژو مانگو هاوچەشنەکانی بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی لای خەڵکی ناودەبرێ.

**تیمساح:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: تیمساح لەخەودا پۆلیسە، چونکە تیمساح لەدەریادا بەزیانە، هەروەها تیمساح دزێکی ناپاکە، وەك درندەوایە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر بازرگانی ناپاکی ستەمکار.

*ئەگەر بینی تیمساحێك بەکێشیدەکات بۆ نێو ئاوو لەناو ئاوەکەدا دەیخوات دەکەوێتە دەستی پۆلیسو ماڵەکەی دەباتو دەیکوژێت، ئەگەر سەلامەتبوو کاتێ کەوتەدەستی پۆلیسەکان سەلامەتو پارێزراو دەبێت.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی تیمساح لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خراپەو حەرامو کاروکاسبی حەرامو ترسوبیم، یاخود بێزاری دەربڕین لەوەستانی رەشەبا یان لەدزو جەردە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر کۆتایی هاتنی تەمەن بەهۆی

غەرقبوونەوە، هەروەها بینینی تیمساح لەنێودەریادا هیچ خێرێکی تێدا نییە.
*دەگونجێت دوژمنێکی سەرشۆڕو رسوابێت لەبەرئەوەی لەشوێن و جێگەی خۆیدا نییەو تێدا نازی.
*ئەگەر بینی تیمساحێك بەکێشیدەکات بۆ نێو ئاو فەرمانڕەوا یان پیاوێك لەماڵەکەی شتێك دەبات و خۆی پێی ناخۆشە.
*ئەگەر بینی تیمساحەکەی بەکێشکرد بۆ وشکانی زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکەیداو ماڵ و داراییەکەی دەبات.
*ئەگەر بینی گۆشتی تیمساح دەخوات یا پێست و چەورییەکەی یا هەر بەشێکیتری بەو ئەندازەیە لەماڵی دوژمنەکەی دەبات.

**تینوویەتی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر وەستانی حاڵ و باری خاوەن موڵك و کێڵگە. دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەژاری یان وەستانی حاڵی بژێوی پەیداکاران.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: تینوویەتی لەخەودا ناتەواوییە لەئاییندا، ئەگەربینی تینوویەتی و ویستی ئاوی رووبار بخواتەوە بەڵام نەیخواردەوە لەغەم و پەژارە قوتاربدەبێ بەپێی چیرۆکی ((طالوت)) کەلەقورئاندا هاتوە: ﴿ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي ﴾ (البقرة: ٢٤٩).
*هەندێکدەڵێن: ئەوی بیەوێت ئاو بخواتەوە بەڵام نەیخواتەوە پێداویستی خۆی بەدەستناهێنێ، ئەوەشی ئاوی ساردبخواتەوە ماڵ و دارییەکی حەڵاڵ بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر بینی تێر ئاوبوە بەڵگەیە لەسەر دروستی ئاینەکەی و جێگیربوونی و باشبوونی حاڵ وباری.
(نابلسی) دەڵێت: تینوویەتی بەڵگەیە لەسەر خۆنواندن بەرەفتاری فیتنەکاران چونکە لەرۆژی قیامەتدا دەهێنرێتەسەر حەوزو ئاو نادرێت، ئەگەر بینی تینوویەتی پێویستی بەهاوسەرگیری و مارەبڕینە.

## ت ێ

**تێری:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: تێری لەخەودا بێزاری و وەڕسبوونە.
*ئەگەر بینی تێرە یاخود بینی دەمی پڕبوە لەخواردن و هیچ بۆشاییەکی نەماوە گۆڕانی بارو حاڵیەتی و کەوتنیەتی لەوحاڵەی لەسەریەتی لەدنیادا یان مەرگێتی مەگەر لەدەمیا بۆشاییەك بەدیبکات ئەوجا رزق و رۆزی دەدرێت بەئەندازەی ئەو بۆشاییەی لەدەمیا دروستبووە.

*تێری لەخەودا بەدەستهێنانی بژێوی‌و گەڕانەوەی ماڵ‌و سامانە.

*هەندێکـدەڵێن: برسـێتی باشـترە لەتێری‌و تێرئاوی باشترە لەتینویەتی.

**تێکۆشەر (ڕەنجدەر - هەوڵدەر):** (نابلسی) دەڵێت: ڕەنجدەر بانگخوازە، دەگونجێت لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر خاوەن هەواڵ‌و دەنگ‌و باس وەك پۆستەو شتی نایاب، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ڕەنجدەرو تێکۆشەر بۆخێرو چاکە.

**تێکەڵەی خواردن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەمووی غەم‌و پەژارەو شەڕو ئاژاوەیە، ئەگەر لێیخوارد غەم‌و پەژارە ڕووی تێدەکات، بەڵام ئەگەر بینی بەلام لێینەخوارد ماڵ‌و سامانێکە زەرەری لێدەکات.

**تێکەڵەیەك لەبۆنیخۆش:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر (حەج)، هەروەها دەڵێت: ماڵ‌و داراییە یان شکۆمەندییە.

*ئەگەر بینی لەماڵی کەسێکی پێشەنگدا بەم بۆنە کاسدەبێ ناپاکی لەگەڵدا دەکرێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی بۆنی ئەم تێکەڵەیەیکرد پیاهەڵدانی باش بەدەستدەهێنێ.

*هەروەها (نابلسی) دەڵێت: غەم‌و پەژارەخواردنە بەهۆی تومەتبارکردنەوە کەلەلایەن کەسێکی سەرووی خۆیەوە ئەنجامدەدرێت‌و خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾. ( آل عمران : ١٦١).

**تێکەوتن (پێهەڵخلیسکان):** (نابلسی) دەڵێت: تێکەوتن لەزماندا دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قاچ هەڵخلیسکان‌و بەپێچەوانەشەوە.

*دەگونجێت پێهەڵخلیسکان بەڵگەبێت لەسەر تیاچوون‌و فەوتانی ئەوەی ئەنجامیدەدات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەڵە‌و لەبیرکردنی زانیاری.



# جيم

## جا

**جـاپليق**[1] : (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی بوە بەجاثلیف بەڵگەیە لەسەر مردنی یان غەرقبووی یان نزیکبوونەوەی لەتیاچوون و فەوتان یاخود لەناوچوونی نازو نیعمەت.

**جادوو( سیحر )**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا فیتنەو لەخۆباییبوونە ، ئەگەر بینی جادوویکرد یان جادووی ئەنجامدا بەهۆیەکی بەتاڵو پووچ ناکۆکی دەکەوێتە نێوان خۆی و هاوسەرەکەیەوە.

*جادوو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+بێباوەڕی.

+جیابوونەوەی ژن.

*ئەگەر بینی جادووی لێکراوە یاخود جادوو ئەنجامدەدات فیتنەو پلان و ناپاکییە.

*ئەگەر جادووکرا لەلایەن جنۆکەوە بەهێزترو فروێڵدەکات.

**جادووگەر**: لەخەودا پیاوێکی هەڵخەڵەتێنەرە ئەگەر بەهۆی پوولەوە جادووی لێکرا جادوو لەژنێکدەکات.

**جاڵجاڵۆکە** : (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ژنێکی نەفرەتلێکراو سەرجێگەی مێردەکەی بەجێدەهێڵێ.

*بینینی تەناف و ماڵەکەی هێنانی ژنێکی بێدینە.

*ئەگەر جاڵجاڵۆکەیەکی بینی پیاوێکی فێڵبازی لاوازو پەنهان دەبینێ.

(نابلسی) دەڵێت: پیاوێکی چنەرە، یان پیاوێکی خواناسی دنیانەویستە، ئەگەر جاڵجاڵۆکەیەکی گرت هاوەڵایەتی پیاوێکی خواناسی و دنیانەویستدەکات.

*ئەگەر ماڵی جاڵجاڵۆکەی بینی تەنانەت لاوازبوو لاوازی و سستی رووی تێدەکات بەپێی ئایەتی: ﴿ وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ ﴾ (العنكبوت:٤١).

*جاڵجاڵۆکە بەڵگەیە لەسەر ژنێکی دڵخۆش.

---

[1] **جاثلیق**: پێشەنگی قەشەکان. (وەرگێڕ)

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چنین و تەونکردن.

*ئەگەر جاڵجاڵۆکەیەکی بینینی کەوتەخوارەوە بەڵگەیە لەسەر سەختی زستان.

**جاڵجاڵۆکەی مارئاسا:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ژنێکی بەزیان.

*لەخەودا دوژمنێکی بەدوخراپی شێوە ناشیرینەو مرۆڤ دەپێکێ و بریندارێدەکات.

**جام(لەگەن):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ژن و کوڕو کچی بەسوودو نرخدار بەئەندازەی بەهاکەیەتی.

**جامباز:** (نابلسی)دەڵێت: جامبازی ئاژەڵ و وڵاخ پیاوێکی بەڕێزە ڕێزداری زاڵدەکات بەسەر دنیای خۆیداو بەڵگەیە لەسەر فەرمانڕەواو کاربەدەست.

**جامێکی گەورە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کچێکە لەسەردەستی خێرێکی زۆر بەدی دێت.

**جانەوەری زەوی:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا هاتە دەرەوە بەڵگەیە لەسەرئەوەی خەوبینەر دەبێت بەسیخوڕی فەرمانڕەواو دەستەلاتدار.

*دەگونجێت سەرهەڵدانی لەجیهاندا بەڵگەبێت لەسەر فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەو سەرخستنی خواناسان و تیاچوونی دووڕوان.

**جانەوەری ژاردار:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر مرۆڤێك بەدووزوبانی نێوانی خەڵکی تێکدەدات و شەڕو ئاژاوە دەخاتە نێویانەوە تووشی شەڕیاندەکات و لەخێروچاکە دەیانگرێتەوە.

*هەروەها بەڵگەیەلەسەر:

+هەژاری.

+غەم و پەژارە.

+پیاوێك سووکایەتی پێکرابێت.

+زیانێك لەلای کۆمەڵێك دەوارو گوندنشینەوە.

*ئەگەر ڕوویکردە نەخۆش دەمرێت چونکە ژاردارە.

**جانەوەری گوێچکە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دوژمنی سەرکردەو بەرپرسانە.

**ج ب**

**جبە(کەوڵ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: جبە ژنە ، ئەگەربینی جبەیەکی پۆشیوە دەگات بەژنێکی عەجەمی، ئەگەرجبەکە ڕەنگاو ڕەنگبوو ژنێکی بەسۆزو خێرداردەبێت لەمناڵخستنەوە، پشتی جبە گەر لەلۆکەبێت ئاین باشییە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر ژنێك جبەیەكی بینیو ناوەكەی دی لەپێستی ڕێوی یان گیانـداری‌ێكیتر دروسـتكرابوو ناپـاكی دەكـات لەمێردەكـەی بەدەسـت تێكەڵكردنی لەگەڵ پیاوێكی تردا.

*هەروەها جبە لەخەودا تەمەندرێژییە، یـان دەوڵەمەندییـە بـۆ یـەكێك لەبـەری بكات چونكە ڕێگرە لەسـەرما ئەمـەش بەهەژاری لێكدەدرێتەوە.

*لەبـەركردنی لـەوەرزی هاوینـدا غەموپەژارەیە لەلایەن هاوسەرەوە یان قەرزاریو نەخۆشـیو زیندانییـە یاخود بەڵاو نەهامەتییە لەپێناوی ژنێكدا.

*ئەگەرخەوبینـەر جـەنگاوەربوو یـان كەسێكبوو لەریزی ئەواندابوو قـەڵغانو سـوپەرەكەی دەپۆشـێتو ڕووبـەڕووی دوژمنی دەبێتەوە.

(ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: ژنێكـە یـان قوتاربوونە لەغەمو پەژارەو نەهامـەتی، ئەگـەر جبەیـەكی لەبـەردابوو قەڵـەمو دەفتەرێكیشی بەدەستەوەبوو هـەژاری چارەسـەردەكات بەخزمـەتكردنی پادشاو فەرمانڕەوا.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: جبەو عەبا ڕێزو شكۆی پیاوە لەگەڵ پیاوەتی بـەپێی جبەكـەو ئـەو تایبەتمەندییـەی هەڵیگرتووە.

*ئەگـەر ئـەوەی جبـەی لەبـەركردبوو لەوانەبوو كەسەرباز بەدوویدا دەڕۆیی، لەوانەیـە سـەرۆكایەتی سـوپادەكات، ئەگەر شایستەی پلەوپایەبوو بەدەستی دەهێنێـت، وەگـەرنا دەسـتدەگرێ بەسـەر خانەوادەكەیـداو بەخێویاندەكات.

*هـەروەها دەڵـێن: جبـە پیـشەیەكی باشـەو پیـشەوەرەكەی غـەمو پـەژارە دەخـوات، یـان بەقەرزدانـەوە ڕاڤەیدەكن.

*هـەروەها دەڵـێن: سـەفەرێكی باشـەو دڕانی بەڵگەی مەرگە.

*ئەگـەر بینـی ئـاگر كەوتـەوەو هـیچ بەسەر جبەكەیدا نـەهات زیان لـەماڵو سامانیدەكەوێ.

*لێـسەندنی جبـە بەڵگەیـە لەسـەر سەركەوتنی پلەوپایەو شكستهێنان.

## ج ر

**جرج( مشكی گەورە )**: (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی مشكێكی گەورەی هـەڵگرتووە یـاخود جرجێـك دێتـە لای لـەولاتی خـۆی كۆچـدەكات، ئەگـەر موڵكداربێت دەیفرۆشێت.

*ئەگەر جرجی لەماڵی خۆیدا بینی یان لـەماڵی یـەكێكیتردا بـا ئـەو ماڵـە پارێزراوبێـت لـەدز یـاخود بـا وریابێـت

لەوەی کەلەگەڵیدایە چونکە شتومەکی
ئەو بەکاردەهێنێ.
*ئەگەربینی گۆشتی جرج دەخوات
غەیبەتی مرۆڤێکی بەدو خراپدەکات.
*جرج بەڵگەیەلەسەر دزی دەمامك
پۆش.
*هەروەها بینینی جرج بەڵگەیە لەسەر
خراپەو بەدکاریی کۆبوونەوەو منداڵ
یاهەڵهاتنی قەرزار لێی یاخود
دەستگیرکردنی.
*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر
ملکەچیو سەرشۆڕی.
*ئەوەی گۆشتی جرج بخوات لەخەودا
رزقو رۆزییەکی حەرام بەدەست
دەهێنێت.

**ج ز**

**جزدان(کیس):** (ئیبن سیرین)دەڵێت:
جزدان وەك کیسە وایە، هەروەها
وتراوە: ماڵو سامانە.
*ئەگەر بینی جزدانەکەی کەوتە دەریاو
روبارەوە ماڵو سامانەکەی
لەسەردەستی پادشایەك تیادەچێت.
*ئەگەر بینی کەوتە نێو ئاگرەوە ماڵو
سامانی لەسەر دەستی فەرمانڕەوایەك
تیادەچێت.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا کوڕو
هاوسەرە بۆ رەبەن، دەگونجێت
بەڵگەبێت لەسەرئەوەی زێڕو درهەمو
خشڵ یان گەوهەرو کلیلی تیادادەنرێ.
*هەروەها دەڵێن: لەشولاری مرۆڤە
ئەگەر جزدانەکەیان بەزۆر لێسەند
بەڵگەیە لەسەر مردنی، ئەگەر
لەنێوقەدی خۆیدا بینی لەنیوەی
تەمەنی سوود وەردەگرێ.
*ئەگەر دڕابوو زانیارییەك وەردەگرێتو
لەبەریدەکات پاشان پێویستی بەوانە
دەبێت.

**ج گ**

**جگەر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: جگەر
شوێنی تووڕەبوونە لەگەڵ سۆزو
بەزەیی.
*هەروەها دەڵێن: جگەر بەڵگەیە
لەسەر منداڵو ژیان.
*هاتنەدەرەوەی جگەر لەسك
دەرکەوتنی ماڵێکی شاراوەیە.
*ئەگەر بینی جگەری مرۆڤێك دەخوات
ماڵو سامانێکی شاراوە
بەدەستدەهێنێو دەیخوات، ئەگەر
چەن جگەرێکبوو بەلێنراویو
سورەوەکراویو بۆگەنی گەنجو سامان
بەدەستی دەهێنێ ، جگەری مرۆڤو
ئاژەڵ چوونیەکە.
*خواردنی جگەری مرۆڤێکی ناسراو
خواردنی ماڵەکەیەتی، ئەگەر تەماشای

جگەریکردو رووخساری خۆی تێدابینی دەمرێ.

*ئێش و ئازاری جگەر لەلێکدانەوەدا خراپ مامەڵەکردنە لەگەڵ کوڕدا، پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ: "منداڵەکانمان جگەرمانن"[1].

*برینی جگەر مەرگی رۆڵەو جگەرگۆشەیە، زوخم و کێمی جگەر زاڵبوونی حەزو ئارەزووە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا شوێنی ئازایەتییە، ئەگەر بینی جگەرێکی گەورەی هەیە کەسێکی بەسۆزو بەزەیی و ئازایە.

*ئەگەر جگەری چەوری بەسەرەوەبوو ماڵ و سامانە لەلایەن ژنانەوە.

*ئەگەر جگەریخوارد هێزو تواناو سوود لەکوڕەکەی وەردەگرێ.

*جگەر چێشتلێنەری فەرمانڕەوایە.

*دەگونجێت هاتنەدەرەوەی جگەر لەناوسکدا بەڵگەبێت لەسەر ستەم و باش نەبێت.

*جگەر ماڵ و سامانێکی بەتاڵ و پووچە.

[1] (عجونی) لە(کشف الخفاو والالباس) (١/٣٠٧) هێناویەتی.

*ئەگەر بینی جگەری دەخوات ماڵ و سامان بەدەستدەهێنێ و دەیخوات یاخود ماڵی کوڕەکەی دەخوات.

**جگەرئاوسان:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی و پەژارە یان ژنێکی شۆخ و شەنگی دەستبڵاو.

## ج ل

**جل وبەرگ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: جل وبەرگ چوارجۆرە و بەم شێوەیەیە:

١) **جلوبەرگی خوری:** ماڵ وداراییە.

٢) **جلوبەرگێك لەموو دروستکرابێ:** ماڵی جیایە.

٣) **جلوبەرگی لۆکە:** ماڵ وداراییە.

٤) **جلوبەرگی کەتان:** ماڵێکی جیایە.

*باشترین جل وبەرگ نوێیەکی فراواون و گوشادو سفتە ، هەروەها جل وبەرگی درێژ باشترە لەجل وبەرگی کورت.

*کۆنی و چڵکنی جل وبەرگیش هەژاری و غەم و پەژارەیەو تێکچوونی ئاینە. چڵك و خۆڵاوییبوونی لەش ولار جوانی دنیاو ئاینە، جل وبەرگی سووریش بۆ ژن باشە، بەڵام بۆ پیاو باش نییە چونکە جوانی شەیتانە مەگەر سووری لەدامێن یان جێگەو پێخەفدابێت و پیاو پێوەی دەرنەکەوێت ئەوجا خۆشحاڵی و شادییە.

*هەموو زەردییەك لەجلوبەرگدا نەخۆشییە، هەروەها وتراوە: سووری غەمو پەژارەیە، سووریو زەردی لەلاشەدا زەرەر دەدەن.
*سەوزی لەجلوبەرگدا باشە لەئایندا چونکە جلوبەرگی بەهەشتیەکانە.
*جلوبەرگی رەشیش باشە بۆیەکێك گەربەبێداری لەبەری بکاتو دەستکەوتو دەستەلاتو شکۆدارییە بەدەرلەوە خراپە.
*جلوبەرگی ئاوریشمو خوری ماڵودارایيەکی زۆرە ، هیچ جۆرێك لەجلوبەرگ ئەوەندەی خوری باش نییە.
*نیشانەو هێمای سەر جلوبەرگ لەخەودا سەفەرە بۆ (حەج) یان رووبەرۆژئاوا.
*جلوبەرگی رەنگاورەنگ بەلگەیە لەسەر بەدەستهێنانی دەستەلات بۆیەکێك شایستەی بێتو بەلگەیە لەسەر جوتیارو فەرووبەرەکەت بۆ یەکێك شایستەی بێت، بۆژنیش پتر شکۆمەندیو خۆشحاڵییە، ئەوەی جلوبەرگی رەنگاورەنگی ببەخشێ ماڵو دارایی لەلای عەجەمەوە بەدەستدەهێنێت یان لای خەڵکی ناموسوڵمانەوە.
*جلوبەرگی شێوەدار بەلگەیە لەسەر قامچی.
*جلوبەرگی تۆکمەو قایم بەلگەیە لەسەر دەستەلاتو پلەوپایەو ناوبانگدەرکردن.
*جلوبەرگی کەتان بۆئەوەی دەیپۆشێت بژێوییەکی رێزدارو ماڵێکی حەلاڵی دەستدەکەوێت.
*جلوبەرگی خەت خەت بەلگەیە لەسەر باشی دنیاو قیامەت، باشترین جلوبەرگیش ئەوەیە لەخوری دروستکرابێت.
*جلوبەرگی خەت خەت باشە بۆ خەوبینەر، بەلام جلوبەرگی خەتی ئاوریشم ماڵێکی حەرامە.
*جلوبەرگی کۆنە غەمو پەژارەیە ، ئەوەی ببینێ دووجلوبەرگی کۆنەی پارچە پارچەکراو بەسەریەکدا لەبەرکرد بەلگەیە لەسەر مردنی، درانی جلوبەرگیش ئابڕوچوونیەتی، جلوبەرگ دڕاویش بەباری درێژیدا بەلگەیە لەسەر دەروولێکردنەوە.
*ئەگەر ژنێك کراسەکەی بەکۆنەو کورتی بینی نهێنی دەدرکێنێت.
*ئەگەر کراسەکەی بەری بدڕێنێ ناکۆکیو بەربەرەکانی لەگەڵ خانەوادەکەی دەکاتو بژێوی پووچەڵدەکاتەوە، ئەگەر جلوبەرگی

شـــرِوكۆنەی لەبــــەرکردو پارچــــە پارچەبوبوو بەسەریەکدا هەژاری خۆی‌و کورِەکەیەتی.

*ئەگـەر جل‌وبـەرگی کۆنـەی لەبـەری بێباوەرِدا دی تێکچوونی حاڵ‌وبارییەتی لەدنیاو قیامەتدا.

*هـەروەها وتـراوە: جل‌وبـەرگی خـەت خەتی ناشیرین بەڵگەیە لەسـەر زیـان‌و بێکاری.

چڵك‌و پیسیش ئەگەر بەجل‌وبـەرگ یـان لەش‌و لارو قژەوەبوو غەم‌و پەژارەیە.

*چـڵك‌و پیـسی بەسـەر جل‌وبەرگـەوە بێچەوری بەڵگەیە لەسەر شێوانی ئاین‌و زۆری گونـاهو تـاوان، ئەگـەر چـەوری لەگەڵـدابوو تێکـچوونی دنیایـە، شـتنی ئەوچـڵك‌و پیـسییە تەوبەیـە ، شـتنی مـەنی (ئاوی‌پیـاو) بـەو جل‌وبەرگـەوە تەوبـەو پەشـیمانییە لـەزینا، ئەگـەر خـوێنی پێوەبـوو شـتی تەوبەیــە لەکوشـــتن، شــتن‌و پاککردنـــەوەی لەپیسی تەوبەیە لەکاروکاسبی حـەرام، داکەنـدنی جل‌وبـەرگیش لەبـەر پیـسی رەواندنەوەی غەم‌و پەژارەیە، هـەروەها سووتاندنیشی.

*وێنـەی بلبـل لەجل‌وبەرگـدا رێگـرە لەســەفەر یـان هـەرکارێك بـەنیازبێت ئەنجامیبـــدات ، ئەوکارەشـــی بـــۆ بەجێنایـەت هـەتا جل‌وبەرگەکـە وشـك نەکاتەوە.

*ئەگەربینی پینـەی نـوێ بەرجلـەکانی کەوتەوە ماڵ‌ودارایی شکستی بەسـەردا دێت.

*ئــــەو جل‌وبەرگەشــــی بــــەدیاری دەبەخــــشرێ رێـــزو شـــکۆمەندی‌و دەستەڵاتە.

*خـواردنی جل‌وبـەرگی نـوێ خـواردنی ماڵ‌و دارایی حەڵاڵە.

*ئەگـــەر بینـــی جل‌وبـــەرگی ژنـــانی لەبەرکردوەو لەناخ‌و دەروونیدا بیـەوێت خۆی بچوێنێت بەوان غەم‌و پەژارە دێت بەسـەریا لەلایـەن دەسـتەڵاتدارەوە ، ئەگـەر واگومـانی بـرد لەگـەڵ پۆشـینی ئـەو جل‌وبەرگـە عـەورەتی وەك ئەوانـە دەردەکەوێت ملکەچ‌و رسوادەبێت.

*ئەگەر لەگەڵ پۆشینی بۆ جل‌وبـەرگی ژنان ژنـی مـارەبری‌و عەورەتیشی وەك ئـــەوانبوو دوژمنـــەکانی زەفـــەری پێدەبەن.

*ئەگـەربینی جل‌وبـەرگێکی پۆشـیوەو درزیویەتی‌و زەوتیکـردوە لەدەسـتەڵات‌و فەرمانبەرداریی دەخرێت.

*ئەگەربینی هەنـدێك لەجل‌وبەرگەکـەی یـان کەل‌وپـەلی ناومـاڵی لەدەسـتداوە

هەندێك لەوەی هەیەتی دەپێچرێتەوەو نامێنێت.

*زەردی جلوبەرگیش نەخۆشیو لاوازییە جگە لەجلوبەرگی ئاوریشم، وتراویشە: ئاویشم بۆ ژنان باشە، بەلام تێکچوونی ئاینی پیاوانە.

*جلوبەرگی رەش بۆئەوەی رانەهاتوە لەبەری بکات توشبوونی خراپەیە، ئەوەشی راهاتوە لەسەر لەبەرکردنی باشە، هەروەها بۆ نەخۆش بەلگەی مردنە، چونکە خانەوادەی مردوو دەیپۆشن، جلوبەرگی شینیش غەمویەژارەیە.

*جلوبەرگی نەخشەدار بەرەنگاورەنگ وتەی دەستەلاتدارەو خەوبینەر رقی لێییەتیو غەمویەژارەی هەلگرتوە دەربارەی.

*جلوبەرگی دووروو یان دوورەنگ پیاوێکە دلی دیندارو دنیاداران رادەگرێ، ئەگەر نوێبوو بەلام پیسبوو دنیا بەدەستدەهێنێت لەگەل قەرزاریدا.

*هەروەها دەلێن: جلوبەرگی نەخشەداری رەنگاورەنگ کوشتارکارە لەگەل ئەوەی پیشەکەی بۆسەرجەم خەلکیش بەلگەیەلەسەر غەمویەژارە، بۆنەخۆشیش زیادبوونی نەخۆشیەکەیەتی، بۆژنان باشە بەتایبەت ژنانی جوانو شۆخو شەنگ چونکە بەسروشتی خۆیان جلوبەرگی ئاوا دەپۆشن.

*جلوبەرگی نوێش بۆ دەولەمەندو هەژار باشەو بەلگەیە لەسەر گەنجو سامانو شادیو خۆشی.

*ئەگەربینی جلوبەرگی نوێی پۆشیوە بەلام پرزۆلپرزۆل بوە ئەگەر نەیتوانی چاکیبکات سیحری لێدەکرێت، ئەگەر بەچەشنێ دڕاو لەتوپەتبوو کورێکی دەبێت.

*جلوبەرگی ناسك نوێکردنەوەی ئاینە.

*ئەگەر بەسەرجلوبەرگەکەیدا لەبەریکرد بەلگەیە لەسەر تێکچوونی ئاینو هەلە لەئایندا، ئەگەر لەژێر جلوبەرگەوە لەبەریکرد بەلگەیە لەسەر نهێنیو دیاری یاخود بەشێکە لەکردارو رەفتاری بەرچاویو خێرێکی جەمو پەسمەندەکراوە.

*ئاوریشمو جلوبەرگی هاوچەشنی ئەو ناگونجێت زانایان بیپۆشنو بەلگەیە لەسەر خوازیارییو بەدواداچوونی دنیا، هەروەها بەلگەیە لەسەر بانگهێشتی ژنان بۆ بیدعەو بەلگەیە لەسەرئەوەی کردارو رەفتاری وەها ئەنجامدەدەن شایستەی بەهەشتن لەسەریو پلەوپایەی لەسەر وەردەگرن.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیریکردن.
*جلوبەرگی دوویەری دووراو بەئاڵتوونو زیوو لەئاینو دنیادا بەشەو گەیشتن بەهیواو ئاواتە.
*ئەگەربینی بوە بەخاوەنی جلوبەرگی ئاوریشمو سیپاڵ - پارچەی ئاوریشمی - و پۆشیویەتی وەك تاج یاخود تاجی گەوهەربەند پیاوێکی دیندارەو تێدەکۆشێتو پلەوپایەو دەستەڵات بەدەستدەهێنێت.
*دوورینی جلوبەرگ بەڵگەیە لەسەر سەفەر، ئەگەر جلوبەرگەکەی دوورییی پاشان بڕی ئەو داوایەیکردوویەتی گەیوەتە کۆتاییەکەیو دوایهاتوە، خۆنەگەر لەشەڕو ئاژاوەدابوو دەبڕێتو دوایی دێت.
*ئەگەر زیندانیو دیلبوو ئازاد دەکرێت، دوورینی جلوبەرگی خوریو لۆکەو مووئاوریشم هەموو چوونیەکن.
*بینینی جلوبەرگ بەشێوەیەکی لووولکراو سەفەرە، هەڵخستنی جلوبەرگیش گەڕانەوەیە لەسەفەر یاخود گەڕانەوەی کەسێکی نادیارو غەریبە.
*ئەگەر شێرێکی بینی جلوبەرگێکی لۆکەو کەتانیشی لەبەرکردبوو فەرمانڕەوایەکی ستەمکارە ماڵودارایی و ئابرووی خەڵکی زەوت دەکات.
*لەبەرکردنی جلوبەرگی سپی باشی دنیاو ئایینە بۆئەوەی بەبێداریو ئاگاداری لەبەریبکات، بەلام بۆ پیشەوەران پشووە ئەگەر لەکاتی کارو فرمانیاندا نەیپۆشن.
*جلوبەرگی سەوز هێزو ئاینەو زیادەی بەندایەتییە بۆ زیندوو مردوو باشی حاڵوبارە لای پەروەردگارو جلوبەرگی بەهەشتییەکانە، هەروەها لەبەرکردنی جلوبەرگی سەوز بۆ زیندوان بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی میراتیو بۆ مردووش بەڵگەیە لەسەرئەوەی لەدنیادا بەشەهیدی کۆچدەکات.
*جلوبەرگی سووریش بۆ پیاوان خراپە مەگەر دامێن بێت، هەروەها رەنگی سوور بەڵگەیەلەسەر خۆشحاڵی بۆژنانیش لەدنیادا باشە.
*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر زۆری ماڵودارایی لەگەڵ رژدیو دەرنەکردنی مافی خودا تێدا.
*لەبەرکردنی پادشا بۆ جلوبەرگی سوور بەڵگەیە لەسەر سەرقاڵیو خەریکبوون بەیاریو گاڵتەوگەپەوە.
*هەروەها دەڵێن: جلوبەرگی سوور لەکاتی نەخۆشیدا بەڵگەیە لەسەر

مەرگ، ئەگەر جلوبەرگی سوور لەبەر بکات لەرۆژی جەژندا زیانی پێناگەیەنێت.

*زەردی سەرجلوبەرگ نەخۆشیو لاوازییە،مەگەر ئاوریشم نەبێت وتراوە باشە بۆ ژنانو ئاین شێوانو تێکچوونی پیاوانە.

*جلوبەرگی رەش بۆئەوەی رانەهاتووە لەسەر پۆشینی توشبوونی خراپەیەو دەڵێن بۆ نەخۆش بەڵگەیە لەسەر مەرگ، چونکە کەسوکاری نەخۆش دەیپۆشنو جلوبەرگی شینیش غەمو پەژارەیە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودابینی جلوبەرگی خوری لەبەرکردوە پارێزکاریو دنیانەویستی رووی تێدەکاتو خەڵکی بانگدەکات بۆ زوهدو دنیانەویستیو هانیاندەدا بۆ پیشەوکاری قیامەت.

*هەموو جلوبەرگێکی سەوزیش رەنگەکەی سوود دەگەیەنێتو بێزیانە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر جلوبەرگی سەوز لەبەر بکات میراتی بۆ بەجێدەمێنێت.

*جلوبەرگی سپیش خێروچاکەیە بۆئەوەی بیپۆشێت لەخەودا، بەڵام بۆپیشەوەران بەڵگەیە لەسەر بێکارییان، هەرکاتیش جلوبەرگەکان نرخیان بەرزوگرانبوو بەڵگەیە لەسەر بێکارییان ، ئەوەشی جلوبەرگی درەوشاوە لەبەر بکات دەستەڵاتو پلەوپایە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەربینی جلوبەرگی سووری پۆشیوە ماڵێکی زۆربەدەستدەهێنێت ئەوماڵو دارایییە مافی خوداوەندی تێدەکەوێت، بۆیە با لەخودا بترسێو زەکاتی ماڵەکەی بدات، جلوبەرگی سووریش بەڵگەیە لەسەر مەرگ بۆ نەخۆش.

*بۆ هەژارانیش زیانە، جلوبەرگی رەنگاورەنگیش لەگەڵ سەرجەم رەنگە تێکەڵەکان بۆسەرجەم خەڵکی بەڵگەیەلەسەر برینداری ، بۆ هەندێکیشیان لەرزوتایە.

*جلوبەرگی سووری ژنانیش باشە بۆ یەکێك هاوسەردارنەبێت، بۆئەوەشی نەهاتبێتە گۆرەپانو بەربەرەکانی بکات.

*ئەگەربینی ئەوجلوبەرگەی پۆشیوە لەجەژنو کۆبوونەوەدا هیچ نییە مەگەر جلوبەرگی ئاوریشم ئەوجا تێکچوونو شێواندنی ئایینە.

*ئەگەربینی جلوبەرگی بۆیەکراوی رەنگاورەنگی پۆشیوە گوێبیستی

قسەو گوفتارێك دەبێت لەدەستەلاّتدارەوە خەشمو قینی لێدەبێتەوە با پەنا بەخوداوەند بگرێت لەشەڕو خراپەی، ئەگەر ئەو جلوبەرگە شێوابوو هەژاریو ئابندارییە.

*ئەگەر جلوبەرگی ئاوریشمی بینی (حەج)دەكات، ئەگەر جلوبەرگەكە سووربوو غەمو پەژارەی دنیا نوێدەبێتەوە، جلوبەرگی زەردیش دنیاو نەخۆشییە.

*بۆیەو رەنگیش بەدەر لەوجلوبەرگانەی باسمانكرد لەخۆبایبوونە.

*ئەگەر بینی بوە بەزاناو جلوبەرگی ئاوریشمی پۆشیوە بەدووی دنیادا دەچێتو خەڵكی بانگدەكات بۆكارێكی داهێنراو هێمای سەرجلوبەرگیش سەفەرە بۆ (حەج)و وڵاتی عەرەبی.

*جلوبەرگی سفتیش باشترە لەجلوبەرگی ناسك.

*ئەگەر ژنێك بینی جلوبەرگێكی ناسكی پۆشیوە مەزنیو شكۆدارییەتی، خۆ ئەگەر جلوبەرگی زبرو رەقی لەبەركرد باشترە بۆ دەوڵەمەندو هەژار.

*ئەگەر خۆی بشواتو جلوبەرگی نوێ لەبەر نەكات دوای خۆشتنی دەرووی لێئاوەلا دەبێتو ناگونجێت لەگەڵ خوازو ئاواتی خۆیدا.

*ئەگەر جلوبەرگە نوێیەكە لەتوپەتبوبوو نەیتوانی چاكیبكاتەوە بەئاگابێت بەڵگەیە لەسەرئەوەی خاوەنەكەی منداڵی نابێت، ئەگەر بتوانێت بدورێتەوەو چاكی بكاتەوە دەبپۆشێ سیحرو جادووی لێكراوە.

*ئەگەربینی جلوبەرگێكی كۆنی پرزۆلاّوی پۆشی غەمو پەژارە رووی تێدەكات.

*ئەگەر بینی جلوبەرگی لەتو پەت دەبێت بەباری پانیدا ئابرووی دەچێت لەلایەن پیاوێكی درندەوە ، ئەگەر بەباری درێژیدا جلوبەرگەكەی دڕابوو دەرووی لێدەكرێتەوە.

*ئەگەر پیاوێك بینی جلوبەرگی دڕاوە ئاینەكەی پارچە پارچە دەبێت یاخود بژێوی كەموكوڕی تێدەكەوێت.

*جلوبەرگی هێماداری ناشیرین بەڵگەیە لەسەر زیانو بێكاری.

*ئەگەر بینی جلوبەرگی خۆی یان جلوبەرگی خەڵكیتر دەشوات بەڵگەیە لەسەر زیانو گرفت روو لەبژێویكردن، هەروەها بەڵگەیە لەسەر سەرهەڵدانی شتی نادیار لەكاروپیشەدا.

*ئەگەر بینی جلوبەرگ وندەکات بەلگەیەلەسەر خێروچاکە مەگەر خەوبینەر هەژاربێت یان زیندانی بێت یاخود قەرزار تیاچوونی خاڵی سەرنج راکێشە.

*ئەگەربینی جلوبەرگی نادیاری پۆشیوە پێوەی دەسووڕێتەوەو رەنگیشی سەوزە دڵو دەروونیەتی بەویستی خۆی دەیگۆڕێو هەڵیدەسووڕێنێت.

*ئەگەربینی جلوبەرگەکەی دەخوات لەماڵی خۆیدەخوات بەپێی ئەوەی جلوبەرگی دەدرێتەپاڵ.

*ئەگەربینی جلوبەرگی نوێ قەڵبەی تێدەکەوت شکست روودەکاتە ماڵودارایی ، ئەگەر کۆنەی هەپروناوییوو پەژارەیە.

*ئەگەر لەخەودا سەگێك ببینێ جلوبەرگی خوری لەبەرکردوە بەلگەیە لەسەر دادپەروەریی دەستەلاتدار.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: جلوبەرگی ئاوریشم دەستەلاتە گەرچی لەئایندا خراپە مەگەر لەکاتی جەنگدا نەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا داپۆشەرەو لەزستاندا باشترە تا هاوین.

*ئەگەر بینی جلوبەرگێکی پۆشی یاخود خۆی ئالاند لێوەی سروشتی وانەبوو هەژار دەکەوێ.

*جلوبەرگ سەرۆکە یاخود بۆ بازرگانو زاناو پێشەوا وەك پێشەوایە دڵنیاییە لەهەژاریو خراپە.

*ئەگەر چەلكو پیسی بەجلوبەرگەکانیەوە بینی لەپیشەو بژێویدا خراپدەکاتو پلەوپایەو شانو شەوکەتی کەلدەبێت.

*ئەگەر پیاوێکی خراپی لەهاویندا بەجلوبەرگەوەبینی خۆی جواندەکات بەدرۆو غەمبارە چونکە گەرما لەهاویندا غەمو پەژارەیە.

**جلوبەرگ داماڵین:** بەلگەیە لەسەر دانانی لابراوو لابردنی ئەوەی دانراوە.

*دەگونجێت کیژێك بێت.

*دەگونجێت لەئەستۆکردنەوەی هاوسەربێت.

*جلوبەرگ داماڵین رێزو شکۆو پلەوپایەو حەزکردنە لەسەرۆکایەتی.

**جلوبەرگ کورت:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی یادخەری ئامۆژگاریدەرە ، بەهۆی ئەوەوە خەڵکی تەوبەدەکەن.

*هەروەها دەڵێن: پیاوێکە خێر لەسەردەستی ئەو روودەدات یان دەروو

لەخەڵكیدەكاتەوە چونكە پیسی جلوبەرگ غەمو پەژارەیە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی غەمو پەژارەو نەمانی غەش لەسینەدا.

* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر گۆرانیو شاییو مارەبڕین.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر یەكێك خۆی لەبەرژوەندی كەسێكیتردا ماندوبكات.

**جلوبەرگی رەنگاو رەنگ :** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ئاینو دنیایە، ئەگەر جلوبەرگی رەنگاو رەنگی بەخۆیەوە بینیو شیاوبوو كاروباری كشتوكاڵی پێدەبەسترێ ، ئەگەر دەستەڵاتداربوو فەرووپیتی زەوییە.

*ئەگەر جلوبەرگی رەنگاو رەنگی پێدرا لەلایەن دەستەڵاتدارەوە دەگونجێت یەكێك بیپۆشێ بەڵگەبێت لەسەر قامچی یان نەخۆشی ئاولەو زوخمو كێم.

*جلوبەرگی رەنگاو رەنگ بۆ ژن شكۆمەندیو خۆشحاڵییە.

**ج ل**

**جلەوی كار:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ملكەچیو گوێڕایەڵییە لەگەڵ ماڵو داراییو نیعمەت بۆ یەكێك بەدەستی خۆیەوە بیبینی.

**ج ن**

**جنۆكە :** (ئیبن سیرین)دەڵێت: (ئەبو سەعد)دەڵێت: ئەگەربینی بووە بەجنۆكە پلانو نەخشەی بەهێز دەبێتو بینینی جادووگەرانی جنۆكە بەڵگەیە لەسەر دارمۆز.

* ئەگەر مرۆڤ لەخەودا جنۆكەی بینی بەپێوە وەستاوە ماڵەكەی نزیكدەبێت، هەروەها بینینی بەڵگەیەلەسەر سێ رووداو:

١)زەرەر.

٢)سووكایەتیو رسوایی.

٣)نەزرێك لەئەستۆیدایەو بەجێی نەگەیاندوە.

*ئەگەربینی خەریكە جنۆكە فێری قورئاندەكات یاخود گوێی لێدەگرن پلەوپایەو دەستەڵات بەدەستدەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ﴾(الجن:١).

*ئەگەربینی جنۆكە دێتە ماڵەكەیو وەك دز هەمان رەفتار دووبارە دەكەونەوەو زیانی پێدەگەیەنن دوژمنانی هەڵمەت دەبەنەسەری لەماڵەكەی خۆیدا. لەبنەڕەتیشدا بینی جنۆكە دەستبڕینو چاوبەستە لەكاروباری دنیادا.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی هاوەڵایەتی جنۆکە دەکات لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نزیکی لەسەفەرو ئاگاداربوونی لەنهێنی.

*دەگونجێت بینینی جنۆکە بەڵگەبێت لەسەر:

+سەفەر بەوشکانیو دەریادا.

+فڕاندنو دزیو زیناو مەیخواردن.

+شوێنی بیدعەو کەنیسەو یانەو گۆرانیو مۆسیقا.

*هەروەها بینیان بەڵگەیە لەسەر جادووگەرییو خەیاڵو ئەندێشە یاخود جیاوازی خستنەوە لەنێوان موسوڵمانانو بێباوەڕانداو فەرمان پێکردنو ڕێگری کردنیان.

*ئەگەربینی فەرماندەکات بەسەریاندا چاکە ئەنجامبدەن یاخود ڕێگری لەخراپە بکەن سەبارەت بەخێرو چاکەیەك دەدوێت.

*ئەگەربینی هاوسەرداری لەگەڵ جنۆکەدا ئەنجامدەدات تاقیدەکرێتەوە بەخراپەو نادروستی، دەگونجێت ئازەڵێکی نەخۆش بکرێت، خۆئەگەر لەدەستەڵاتدارانبوو پلەوپایەی بەرز دەبێتەوەو بەو ئەندازەیە.

*ئەگەر کوڕێکی بوو لەجنۆکە رزقو رۆزی لەلایەن کەسێکی نزمو سووکەوە پێدەگات یاخود ماڵو داراییەکی شاراوە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر فەرمانڕەواو پادشایەك بینی جنۆکەیەکی گرتوەو کەلەبچەیکردوەو بەستویەتیەوە دەستەڵاتی زاڵدەکات بەسەر وڵاتداو ئەو بێباوەڕانە دەستگیر دەکات.

*ئەگەر پیاوچاکێك خەوێکی ئاوا ببینێ خۆی لەشەیتان پاراستوە بەرۆژوو شکانی حەزو ئارەزووی.

*ئەگەر زۆرانبازی لەگەڵ جنۆکەدا کرد دڵنیا دەبێت لەشەڕو خراپەیان یاخود لەشەڕی ئەوەی وەك ئەوانە.

*ئەگەر زۆرانبازیو کێشمەکێشمیان لەگەڵکرد بەخراپەو لێنزیکبوونەوە زیانی پێدەگەیەنن، دەگونجێت لەوانەبێت سوو دەخوات.

*پادشاو فەرمانڕەوای جنۆکە بەڵگەیە لەسەر:

+پێشەوای پێشکەوتوو.

+فەرمانڕەوا.

+شێخو زانایان.

+مامۆستاو پەروەردەکاری منالان.

*ئەوەی راستگۆبێت لەگەڵ یەکێك لەوشاجنۆکانە لەبێداریدا بەوە دەناسرێت، یان دەگونجێت ببێت بە شارەزاو شوێنەوارزانێکی دزو جەردە،

دەگونجێت تەوبە بکات ڕێنمایی بکرێت بۆلای پەروەردگار، یان ببێت بەقوتابیو خولیای زانیاریو قورئان، یا دەگونجێت ببێت بەفێرخوازی منداڵان.

*زەوی ئاوەدانکەرانی جنۆکەش لەخەودا دزو جەردەن.

*ئاوەدانکاری حەمامو بیر بەڵگەیە لەسەر زیناو داوێنپیسان لەپیاوانو ژنان.

*ماڵ ئاوەدانکەرەوەش دراوسێی شەڕەنگێزو خراپەکارە.

*دەگونجێت بینینی جنۆکە بەڵگەبێت لەسەر:

+ئاگری بڵێسەدار.

+ئەوەی لەنێو ئاگردا دروستدەکرێت لەدەفری گڵێنەو شووشەو هاوچەشنەکانی.

*دەگونجێت بینینیان لەو شوێنانەدا بەڵگەبێت لەسەر زیندەوەری زیانبەخشە بەمرۆڤ.

**جنێو(قسەی ناشیرین):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: جنێووقسەی ناشیرین کوشتنە.

(نابلسی)دەڵێت: جنێووقسەی ناشیرین بۆ پارێزارانی ئەستۆی موسوڵمانان (أهل الذمة) لەگەڵ بێباوەڕاندا بەڵگەیە لەسەر:

+قسەکردن لەنێوان خەڵکیدا.

+قسە فڕێدان.

+یاخود جنێودانە بەیەکێك گوێڕایەڵی پێویست.

+خراپەکردن لەگەڵ دایكو باوکدا.

+پشتکردن لەپەروەردگار.

+گوێڕایەڵی کەسێك جنێووقسەی ناشیرینی پێدابێت لەخەودا.

**جنێوبەیەك گوتن:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی بەجۆرێکی حەرام قسەو جنێوی بەپیاوێکدا قسەپێوتراو زەفەر بەوتەبێژ دەبات.

*ئەگەربینی کەسێك زاڵبوو بەسەریا یا جنێوی پێدا زاڵدەبێت بەسەر ستەمکاردا ئەگەر جنێوو زاڵبوونەکەی شوێنەوارێکی دیارو بەرچاوی نەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيْهِ لَيَنْصُرَنَّهُ اللهُ﴾(الحج:٦٠).




**جوانکاریی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هەژاریو خراپبوونی حاڵو بار.

*ئەگەر بینی دنیا جوانو ڕازاوە بوە بۆیو داوای گرنگی بۆ بەجێهات هەژاردەکەوێتو بەهیلاکدەچێ.

*جوانكاری لەولآتێكدا كەوا جوانكاری نازانێت لەگەڵ ئەو جلوبەرگەی مرۆڤ راهاتوە لەسەر پۆشینی بۆسەرجەم خەڵكی باشە.

**جوانكاری جلوبەرگ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێكی فێلاوییە قسەی جوانو قەشەنگی هەیە.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر نووسەرو ئەدیبو هۆنراوەنووس یان گۆرانیبێژ.

**جوانی مرۆڤ:** (نابلسی)دەڵێت: جوانی مرۆڤ لەخەودا ئەگەر لەجلوبەرگو شێوەو ئوتومبیلدابێت بەڵگەیە لەسەر خراپی حاڵوباری دوژمنی.

**جوبرەئیل( سەلامی خوای لەسەربێت ):**

(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر وایبینی دژایەتی (جوبرەئیل)و (میكائیل)دەكات یاخود مشتو مریان لەگەڵدەكات لەسەركارێكە شایستەی سزاو تۆڵەی خواییە سات بەسات وەك كەسێك وایە راوبۆچوونی هاوتابێت لەگەڵ رای جولەكەدا.

*ئەگەربینی خواردن لە(جوبرەئیل) وەردەگرێت بەهەشتیدەبێت (پشت بەخودا).

*ئەگەر بەغەمباری بینی نارەحەتیو سزا دێت بەسەریا چونكە پەری سزاو خەشمە.

(نابلسی)دەڵێت:ئەوەی لەخەودا (جوبرەئیل) ببینێ لەگەڵی دەدوێتو ئامۆژگاریدەكات یان وەسیەتی بۆ دەكات بەرووبەكی گەشەوە رێزو مەزنیو مژدە بەدەستدەهێنێت، ئەگەر زوڵمو ستەمی لێكرابوو سەردەكەوێت، خۆئەگەر نەخۆشبێت چاكدەبێتەوە یان بترسێت هێمنو هێور دەبێتەوە، یاخود ئەگەر لەتەنگانەو نارەحەتیدابێت دەرووی لێدەكرێتەوە یا (حەج)ی نەكردبێت (حەج)دەكات، هەروەها بەڵگەیە لەسەر شەهیدبوون گەرچی زۆریش بژی.

*ئەگەر بێباوەرێك (جوبرەئیل)ببینێ ترسوبیمو سزا رووی تێدەكات.

*ئەگەربینی (جوبرەئیل) سڵاوی لێدەكات دەبێت بەزانایەكی بەرزو بەناوبانگ دەردەكاتو لەنێو هاورێكانیدا جێگەی ئاماژە بۆكردندەبێت.

*هەروەها بینینی (جوبرەئیل)بەڵگەیە لەسەر:

+پێغەمبەرو فرستادەی پەری.

+ئەمینی نهێنی.

+مژدەدان بەمناڵی نێرینە.

+خواپەرستیو بەندایەتیو زانیاریو فێرکردنی نهێنی بۆئەوەی شایستەیەتی.

+روح بەرزبوونەوەی ئەوەی لەمەرگ نزیکدەبێتەوە.

+گواستنەوەو جیهادو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا.

+شارەزابوون لەزانستەشەرعیەکانو زانستی ئەستێرەگەرێتی.

*ئەگەربینی چووەتەسەر شێوەی (جوبرەئیل) دەستودڵفراوان دەبێتو خێرو بەرەکەتی لێدەرژێ.

**جورنە یا حەوزی ئاو:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ئەو خراپەیەیە کەمرۆڤ خۆی لێدەپارێزێ، چونکە بەلاو نەهامەتییە.

*دەگونجێت جورنە بەلگەبێت لەسەر ئەوەی ئامادەیە لەبۆبەدەستهێنانی پێداویستی لەخاوەن ماڵ یان بەردەستو زانیاریو منداڵ.

*ئەگەر جورنەکە ئاوی تێدانەبوو ژنێکی هەژاری بێکەڵکە یان نەزۆکەو منداڵی نابێ.

*دەگونجێت جورنە بەلگەبێت لەسەر خراپەو نارەحەتی لەلای خەڵکی ئەو ماڵە یان لەو شوێنەدا.

**جومگەبڕ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: جومگەبڕ پیاوێکە بەگوفتاری ناشیرین خەڵکی لەیەك جیادەکاتەوە.



**جووتبوون:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینینی لەگەڵ خۆیدا جووتدەبێ بەئامرازی نێرینە بەلگەیە لەسەر دابەزینی ویستخوازیو رژدیو زیادەرەوی لەخەرجیداو تیابردنی ماڵو سامانو تەلاقدانی هاوسەرەکەی، ئەگەر هەژاربوو بەلگە لەسەر نەخۆشییەکی توند، دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر چوونە لای مەحرەم لەخانەوادەکەی.

*ئەگەربینی دەچێتە لای منداڵێك بەلاو نەهامەتی رووی تێدەکات.

*ئەگەر چوە لای منداڵێك ماندوبوونو هیلاکی دێت بەسەریا لەگەڵ غەموپەژارەیەکی نەبراوە.

*ئەگەر بینی لەگەڵ ژنێکداجوتبوو کەدەیناسی ئەگەر جوانو داپۆشراوبوو خشڵی پێوەبوو بەلگەیە لەسەر خێرێکی زۆر ، ئەگەر پیربوو جلوبەرگەکەی خراپبوو بەلگەیە لەسەر پێچەوانەی ئەوە.

*جوتبوون لەگەڵ ئەو ژنانەدا کەنایناسێت بەلگەیە لەسەر ئەو

کارانەی هاتوە بەسەریدا بەپێ حاڵی ئەو ژنە لەشێوەو چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەوکارە.

*ئەگەر بینی لەگەڵ خزمەتکارەکەی جووتدەبێ بەڵگەیە لەسەر دڵخۆشبوونی بەوەی دەبێت بەخاوەنیو ماڵو سامانی پێزیاد دەکات.

*ئەگەر بینی لەگەڵ خزمەتکاری پیاودا جوتبوو سووکایەتی پێدەکاتو لێدەدات، بەهەمان شێوە ئەگەر بینی براکەی جووتبوە لەگەڵی بەتایبەت ئەگەر لەوگەورەتربوو.

*ئەگەر دوژمنەکەی لاقەیکرد خراپە، ئەگەربینی لەگەڵ ژنێکدا جووتبوە سوودو قازانجە بەدەستی دەهێنێت.

*ئەگەربینی لەگەڵ کورە بچووکەکەی جووت دەبێ بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی منداڵەکەیو زیانگەیاندن بەخەوبینەر.

*ئەگەربینی لەگەڵ ئەوەدا جووتدەبێ کەبەخێوی کردوەو کردویەتی بەکوڕی خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی منداڵەکەی دەنێرێ بۆلای مامۆستایەك هەتا فێری زانیاری بێت ئەگەر خەوبینەر هەژاربوو، ئەگەر دەوڵەمەندبوو بەڵگەیەلەسەر خەڵاتو بەخششدان بەمنداڵو وەسیەت بۆکردنی.

*ئەگەر بینی کوڕەکەی خۆی لەگەڵی جووتدەبێ بەڵگەیە لەسەر ژیانی کوڕو باوك بەیەکەوە.

*ئەگەر کوڕێك بینی لەگەڵ باوکی جووتدەبێ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەو وڵاتە بەدەریدەکات یاخود دژایەتی باوکیدەکات.

*ئەگەر بینی لەگەڵ کچەکەی خۆی جووتدەبیو هێشتا بچووکە لێکدانەوەی وەك کوڕوایە، ئەگەر گچکە گەورەبوو بەڵگەیە لەسەر بەشوودانی بەپیاوێكو خەوبینەر جیهازی بۆ دابیندەکاتو کچەکەسوود لەباوکەکەی وەردەگرێ.

*ئەگەربینی لەگەڵ کچەکەی جوتدەبێ لەکاتێکدا ژنی پیاوێکیترە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کچەکە لەمێردەکەی جیادەبێتەوەو دەچێتەوە لای باوکی.ئەگەر پیاوێکی هەژار خەوێکی لەوچەشنەی بینیو کچێکی دەوڵەمەندی هەبوو بەڵگەیە لەسەر سوودێکی زۆر باوك لەکچەکەی دەیبینێو لێکدانەوەی خوشکیش وەك کچ وایە.

*ئەگەربینی لەگەڵ براکەی یان هاوڕێیەکی جووتدەبێ بەڵگەیە لەسەر دژایەتی هاوڕێکەیو بەدەستهێنانی زیان.

*ئەگــــەربینی لەگـــــەڵ دایکـــــی جووتبدەبیٚو هێشتا زیندوە لەژیاندایە بەڵگەیە لەسەر دژایەتی باوکیو ئەگەر باوکی نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر مردنیو دواتر خەوبینەر دەبێت بەبەرپرسی ماڵو رۆڵی مێردو کوڕ بۆ دایکی دەبینیٚ، ئەگەر دژی دایکیبوو بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی بۆی.

*ئەگەر کەسێك لەسەفەردابوو بینی لەگەڵ دایکی جووتدەبیٚ بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی لەسەفەر ، ئەگەر ئەو پیاوە هەژاربوو دایکی دەوڵەمەندبوو سەرجەم پێداویستیەکانی بەدەستدەهێنیٚ یاخود دایکی دەمریٚو دەبێت بەمیراتگری.

*ئەگەر نەخۆشێك بینی لەگەڵ دایکی جووتدەبیٚ لەنەخۆشیەکەی چاکدەبێتەوە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر دروستیو ئاسایی بوونی سروشت، ئەگەر دایکی مردبوو بەڵگەیە لەسەر مردنی چونکە زەویش بەدایك ناوزەدکراوە، ئەم خەوەش باشە بۆ یەکێك بەربەرەکانی ئەنجامبدات لەسەر زەوییەك یاخود بۆ کەسێك خوازیاری کڕینی زەوی بێت ، بەلاٚم خراپە بۆ کشتیاران چونکە تۆو دەچێنن لەزەوییەکی مردودا تیایدا ناڕویٚ.

*هەروەها ئەم خەوە بۆ یەکێك لەسەفەردابێت بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆیو ئەوەشی لەژێر سێبەری خۆشی دووکوڕیدا بێت سەرکەوتنی هەمیشە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەربینی لەگەڵ دایکی جووتدەبیٚو هیچ چێژی نامێنیٚ لەوڵاتی خۆی هەڵدێت ئەگەر دوای جووتبوون کارێکی بۆ پێشهات، وەگەرنا بەویستی خۆی لەوڵات بەدەردەکەویٚ.

*ئەگەر بینی لەگەڵ دایکی جووتدەبیٚو لێی لادەدات خراپەو بەڵگەیە لەسەر وەرچەرخانی خۆشەویستی خانەوادە لەوڵاتی خۆیو رقیان لێی یاخود روو لێوەرچەرخانی هاوپیشەوکارەکانیدی.

*ئەگەربینی لەگەڵ دایکی جووتدەبیٚو نوستوە بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو تەنگەژە رووی تێدەکات.

*ئەگەربینی لەگەڵ دایکی جووتدەبیٚ لەنێوان هەردووڕانیدا خراپەو بەڵگەیە لەسەر هەژارییەکی سەخت.

*ئەگەر بینی لەگەڵ دایکی جووتدەبیٚو ئەو لەشوێنێکی بەرزدایە بەڵگەیە لەسەر مردنی بەتایبەت ئەگەر نەخۆشبوو چونکە زەوی دایکەو لەسەرو مردوەوەیە .دەگونجێت ئەو خەونە بەڵگەبێت لەسەر لەشساغیو

بـوونى ژنێكـى خـۆش بەدرێـژايى تەمەنى.

*ئەگەربینى دایكى جووتدەبێ لەگەڵى بەڵگەیە لەسـەر فـەوتانى ماڵومنداڵو نەخۆشكەوتنى خەوبینەر.

*ئەگەربینى لەگەڵ ژنێكیتردا جوتبوو بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەى كەئـەو ژنـە ئاگادارى نهێنى دەبێتو لەراوبۆچوون بەكردارەكانیـدا هاوبەشـدەبێ، ئەگـەر ئەو ژنەى نەناسى كەجووتدەبێ لەگەڵى بەڵگەیـە لەسـەركرداروكارێكى بـەتاڵ ئەنجامدان، ئەگەر ژنێكى مێرددار بینـى لەگـەڵ ژنێكـیتردا جووتـدەبێ بەڵگەیـە لەسەر جیابوونەوە لەگەڵ مێردەكـەىو دەبێت بەبێوەژنو دەیەوێت نهێنى ئـەو ژنە ئاگاداربێ.

*ئەگـەربینى لەگـەڵ پیـاو یـان ژنێكـى مردوودا جوتبـوو یـان بینـى مردوویـەك لەگـــەڵى جووتـــدەبێ بەڵگەیـــە لەسـەرمردنى مەگـەر لەغەریبیـدابێتو ئەو مردوەى دەیبینێ لەوشارەدا نەبێت بەڵگەیـە لەسـەرئەوەى دەچـێتە ئـەو شـــارەى ئـــەو مـــردوەى تێـــدا ئەسپەردەكراوەو جیابوونەوە لەشوێنى خۆى.

*ئەگـــەربینى یـــارى بەدەســـتى خۆیـدەكات لەگـەڵ خزمەتكارەكـەى جووتـــدەبێ چـــونكە دەســـت وەك خزمـــــەتكار وایـــــە ، ئەگـــــەر خزمەتكارینەبوو ملكەچىو زەرەر رووى تێدەكات.

*ئەگـەربینى رەش پێـستێك لەگـەڵ ژنەكـەى جووتـدەبێ مـووى پێـشى درێژدەبێت.

(نابلـسى)دەڵێـت: بەڵگەیـە لەسـەر گەیشتن بە ویستو خواز یاخود ئەوەى خوازیاریـەتى لـەئاینو دنیـادا وەك سـەفەرو جـەنگو چـوون بـۆ لاى دەسـتەلاتدارو سـواربوونو گـەڕان بـەدووى كوشـتاردا چـونكە جووتبـوون چێژو سووددارە.

*ئەگەر لەگەڵ هاوسـەرەكەیدا جوتبوو خوازیاریـەتى بەدەسـتى دەهێنێـتو پێیدەگات.

*جووتبـوون لـەدواوە لەگـەڵ ژنـدا بەڵگەیـە لەسـەر داواكردنـى كـارێكى قـورسوگران لەرێگەیـەكى تـرەوە، دەگونجێـت مەیـسەر نـەبێتو مـاڵو سامانى بەسەربچێت.

**جووتو تاك:** (نابلسى) دەڵێت: بینینى نوێـژى جـووتو تـاك بەڵگەیـە لەسـەر باشـى چـارەنووس لـەدنیاو قیامەتـدا، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر وەرگرتنى شەفاعەتو ئامۆژگارى.

**جوولەكە:** (نابلسى) دەڵێت: لەخـەودا دوژمنـە گـەر پـیر یـان لاو بێـت بـەپێى ئایەتى: ﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ ﴾ (المائدة: ٨٢).

*ئەگـــەر بینـــی مامەڵـــەی لەگـــەڵ جوولەکەیەکدا یاخود هاوڕێیەتی کرد مرۆڤێك دەبینێ نکوولی حەقدەکاتو سووکایەتی پێدەکاتو جادووگەرێکی ناپاکدەبێت.

*ژنە جوولەکەش بەڵێندانە لەدنیاداو نەبردنەسەریەتی.

*ئەگـــەر بینـــی بـــوە بەجوولەکـــە سەرپێچیدەکات.

*ئـەوەی جوولەکەیـەك ببینـێ میراتـی مامی بۆ دەمێنێتەوە.

*ئەگـەر بینـی بەجوولەکـە بـانگکرا خەشـمو قینـی لێبـوەوە جلوبـەرگی سپی لەبەردابوو لەغەمو پـەژارە قوتـار دەبێـتو سۆزو بـەزەیی خـوایی رووی تێدەکات.

*پیرەمێـردی جوولەکـە دوژمنێکـە دەیەوێت دوژمنەکەی تیابچێت.

*هـەروەها وتـراوە: بینینـی جوولەکـە رێنوماییە.

*جوولەکـە لەخـەودا دوژمنـە لەوێنـەی هاوڕێدا.

*دەگونجێت بینی جوولەکە بەڵگەبێت لەسەر بۆنەو غەمو قەساب.

*ئەگـەر بینـی بـوە بەجوولەکـەو بەربـەرەکانی هـەبوو نکوولیـدەکات لەوەی لەسەریەتیو درۆزنە.

*هـەروەها وتـراوە: بەڵگەیـە لەسـەر تێکەڵبوون مامەڵەیە لەگـەڵ جوولەکـە، ئەگـەر خەوبینــەر زانـابوو گـەواهی دەشـارێتەوە لەگـەڵ زانیاریـدا چـونکە جوولەکە حـەقیان زانـیو شاردیانەوە، ئەگـەر قـەرزاربوو نکـوولی لەحـەق دەکاتو ستەم لەخانەوادەکەی.

**جووڵێنـەری فـڕن:** (نابلـسی)دەڵێـت: فیتنەو ئاشووبە.

**جووین:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: جـووینی بنێـشت بەدەسـتهێنانی ماڵوسـامانە بەبەربەرەکانی .

*هـــەروەها: جـــووینی بنێـــشت ئەنجامدانی کاری داوێنپیسییە.

*ئەگـــەربینی بنێـــشت دەجـــووێ رووداووکارێـــك قـــسەی زۆری لەســـەر دەکرێ.

*هەموو جوینێك بـەبێخواردنو قوتـدان قـــسەو وتـــەی زیـــاددە بەئەنـــدازەی جووینەکەو بۆ قامیشی شەکر هەروایە بـــەڵام وتەیەکـــە گوتنـــەوەی بـــاشو خۆشە.

(نابلـسی)دەڵێـت: لەخـەودا بۆشـتێکی بـــــەدەر لەبنێـــــشت نەخۆشـــــییەو وەرنەگرتنی خواردنە.

ج ۆ

**جـۆ**:(ئـيبن سـيرين) دەڵێـت: مـاڵو داراييـــە لەگـــەڵ تەندروســـتی بـــاش بۆيـەكێك خـاوەنی بێـت يـا بيخـوات‌و باشترە لەگەنم.

*هەندێكدەڵێن: كوڕێكی تەمەن كورتە، چونكە خۆراكی (عيسا)يـە (سـەلامی خوای لێبێت).

*دورێنە لەكاتی خۆيدا ماڵو داراييەكە دێتـە دەسـتی مـافی خوداوەنـدی تێدەكـەوێ بـەپێی ئايـەتی: ﴿ وَآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾ (الأنعام: ١٤١).

*چاندنی جۆ بەڵگەيە لەسەر كارێك ڕەزامەندی خودای لێبەدەستدێت.

*جـــۆی تـــەڕ فەڕوپيتـــەو كڕينـــی لەدانەوێڵـــەفرۆش بەدەســـتهێنانی خێرێكی مەزنە.

*ئەگەر بـەنێو كشتوكاڵی جـۆدا ڕۆيـی جيهادو تێكۆشانی پێدەبەخشرێ.

*بينينـی جۆ لەهـەموو حاڵێكدا خێـرو سوودو قازانج‌و ڕزق‌و ڕۆزييە.

(نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا ڕزقێكـی باشە بەخێرايی دێت‌و ماندوبوونەكەشی كەمە.

*ئەگـەر بينـی گـەنم بـەجۆ دەفرۆشـێ پياوێكـــە قورئـــانی لـــەبيركردوەو سەرقاڵبوە بـەجۆوە ، ئـەوەی بـەنێويا بـڕوات يـان بـەنێو كـشتوكاڵدا بـڕوات جيهادو تێكۆشانی پێدەبەخشرێ.

*كشتوكاڵيش كردەوەكانی بەندەيە.

*ئەگـەر جـۆی چـاند مـاڵو سـامانێك كۆدەكاتەوە لەبازرگانيـەكی سوودمەند يـان دەسـتەڵات‌و شـوێنێكی ئـاوەدان لەگـەڵ تەندروسـتی لـەش‌و لار يـاخود خێـــرو ســـــوودو قـــــازانجێكی لەدەستەڵاتدارەوە دەستگيردەبێت.

*جـۆ هەسـتكردنە بـەخێرو بەڵگەيـە لەسەر لەشساغی‌و تەندروستی باش.

**جۆلانــە**:(ئـيبن سـيرين) دەڵێـت: جۆلانەيـــەك لەپـــەت دروســـتكرابێت‌و ببينـــێ دێـــت‌و دەچـــێت لەنێويـــدا بيروباوەڕی خراپـە سـەبارەت بـەئاين‌و گاڵتەو سووكايەتييە.

(نابلـــسی)دەڵێـــت: ئـــەوەی خـــۆی لەجۆلانەيەكـدا ببينێتـەوە ئاينەكـەی لەســـەرگەردانيدايەو خۆشـــی نازانێـــت چيدەكات.

ج ە

**جـەردە( گيرفـانبڕ)**:(نابلـسی) دەڵێت: لەخەودا زانايـەكی فڕوفێڵاويـە ، ئەگـەر مـــرۆڤ بينـــی دينـــار لـــەگيرفانی هاتـــە دەرەوە زانيارييـــەكی لێدەبيـــستی بەفڕوفێڵ.

**جەژنی قوربان:** (نابلسی) دەڵێت: گەڕانەوەی خۆشیی و شادییەو قوتاربوونە لەناڕەحەتی ، چونکە قوتاربوونی (ئیسماعیل) ـ سەلامی خوای لێبێت ـ لەم بۆنەیەدابوو لەسەربڕین.

*ئەگەر بینی لەڕۆژی جەژنی قورباندایە ئەگەر زیندانی بێت قوتاردەکرێ، ئەگەر قەرزاربێ دەیداتەوە.

*ئەگەر بینی لەڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندابوو لەغەمو پەژارە قوتاردەبێ‌و شادی‌و خۆشی بۆ دەگەڕێتەوەو تەوبەی لێوەردەگیرێ.

*ئەگەر ماڵو دارایی لەکیسچوو یاخود زەرەریکرد خوداوەند قەرەبووی بۆدەکاتەوە.

*جەژن لەخەودا دەروە، ئەگەر شتێکی لەدەستداو بینی لەڕۆژی جەژندا لەدەستیداوە بۆیدەگەڕێتەوە.

*جەژن فراوانیی‌و گوشادی بژێوییەو بەڵگەیە لەسەر خەرجی.

**جەمیز**[1]**:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ماڵو دارایی حەلاڵ خێری زۆری لەخۆگرتووە ، ئەوەی شتێکی لێبخوات ڕزقو ڕۆزییەکی باش بەدەستدەهێنێت. دارەکەشی پیاوێکی سوودمەندو بەخێرەو توانادارو دەوڵەمەندە.

*هەروەها ژنێکی خاوەن ڕەچەڵەكو ماڵو داراییە.

*دەگونجێت بینی بەڵگەبێت لەسەر لاوازی دڵوچاو.

**جەنگ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: جەنگ لەخەودا بەسێ شێوە هاتووە: یەکەم/لەنێوان دوو فەرمانڕەوادا. دووەم/لەنێوان فەرمانڕەواو خەڵکیدا. سێیەم/لەنێوان خەڵکی خۆیاندا، یەکەمیان بەڵگەیە لەسەر فیتنەو ئاشوبو نەخۆشی، دووەمیشیان بەڵگەیە لەسەر هەرزانی خواردنو شتومەك، سێیەمیشیان بەڵگەیە لەسەر گرانی خواردنو شتومەك.

*جەنگ بشێوی‌و ئاڵۆزییە بۆ سەرجەم خەڵکی جگە لەفەرمانڕەوا سوپاو ئەوەی کاروباری لەگەڵ چەکدایە بۆ ئەوان بەڵگەی خێرو چاکەیە.

(نابلسی)دەڵێت: جەنگ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هەوڵو تێکۆشانو فریوو هەڵخەڵەتاندن بۆئەوەی لەجەنگدا دژایەتی‌و بەربەرەکانی دەکات یان بۆ ئەوەی بەڵگەیە

---

[1] **جەمیز:** بەروبوومێکە لەهەنجیردەچێت. (وەرگێڕ)

لەسەری، جەنگیش بشێوی‌و فیتنەو نەخۆشیە یان تاعونە.

**جەنگ لەدەریادا:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+هەژاری.

+دۆڕان.

+کەوتنە نێو مەترسیەوەو بەتایبەت دوو دوژمن دەریاو دوژمنی بۆسەگری نێو دەریا.

+داوای رزق‌و رۆزییە.

**جەوال:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا نهێنی پارێزە ، ئەگەر شتێکی لێوە دەرکەوت ئەو کەسە نهێنی ئاشکرادەکات‌و ناپاکدەردەچێت. بینینی جەواڵیش بەڵگەیە لەسەر سەفەرو پاراستنی نهێنی‌و هاوسەرو تیم.

**جەواڵدروو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکە هانی خەڵکیدەدات لەسەر سەفەرو گەشت.

*هەروەها وتراوە: خەڵکی نهێنی خۆیانی بۆ باسدەکەن.

(نابلسی)دەڵێت: جەواڵدروو لەخەودا پیاوێکی دانایە سەرجەم خەڵکی فێردەکات چونکە جەواڵ هەموو شتومەکێك دەگرێت بۆیە لەکاتی لێکدانەوەدا نهێنی خەڵکە.

*ئەگەربینی جەواڵدەدووریٚ توانای دەبێت لەزانیاریدا یاخود ساختەی شتومەکەکەیەتی.

**جەیحون:** (نابلسی)دەڵێت: رووبارێکی بەناوبانگی گەورەیە ، ئەگەر بینی خۆی دەشوات تێدا خوداوەند موڵك‌و دەستەلاتێکی مەزنی پێدەبەخشیٚ یاخود پەیوەندی دەکات بەپادشایەکی مەزنەوە، ئەگەر غەم‌و پەژارەداربوو دەرووی لێدەکرێتەوە ، ئەگەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە ، ئەگەر دیل‌وبەندی هەبوو ئازاد دەکریٚ ، هەژاریش بێت دەوڵەمەنددەبێت، زانابێت زانیارییەکەی زیاد دەکات.

*دەگونجێت (جەیحون) بەڵگەبێت لەسەر ولاتی عەجەم.

*ئەگەر ئاوی لێخواردەوە بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی سوودو قازانج‌و شتکی نایاب‌و دەگمەن لەو هەرێمەدا.

## ج ی

**جیابوونەوەی ژن و مێرد:** لەخەودا جیابوونەوە مردن یان جێگەلێجیاکردنەوەو سەفەرکردنە ، خوداوەند دەفەرموێت: ﴿ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ ﴾ (البقرة:١٨٧).

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+فرۆشتن بەمەرجی گەڕانەوە.

+پاشگەزبوونەوە لەئیسلام.

**جیـــاوازیو لێکدوورکەوتنـــەوە:** (نابلسی)دەڵێت: بۆ ئەندامەکان یان بەڵێنـدەران بەڵگەیـە لەسـەر گـۆڕانی هۆکارو هاوسەرو ئاژەڵ.

**جـیرەی دەرگـا:** (نابلـسی) دەڵێـت: لەخەودا شەڕە پێکهاتوە لەپاسەوان یا دەرگاوان یان شەڕو ئاژاوەی نێوان دوو هاوسەر.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر دەرخستنی نهێنی.

*جیرەی پێنووسیش بەڵگەیە لەسەر کاغـەز یـان رووپایـەك بـۆ زانـستپەروەرانو بەڵگەیـە لەسـەر بەرزکردنـەوەی پلەوپایـە یـان بـاش پیاهەڵدانیان لـەلای خـوداو خـەڵکیو، بۆکەسـانی دیکـەش بەڵگەیـە لەسـەر دەرخستنی نهێنیو ماندوکردنیان.

**جیوە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسـەر درۆکـردن لەبەڵێنـداو ناپـاکیو دووڕوویـیو شـوێنکەوتنی ئـارەزوو. ئەگـەر جیـوەی بەدەسـتییەوە بینـی لەئاینەکەیـدا دوودڵـەو شـوێنی حـەزو ئـارەزووی خۆیکـەوتوەو ناپـاكو خیانـەتکارەو خـواردنی هـیچ خێرێکـی تێدا نییە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کاروبارێکە کەوا بەجێنایەت، ئەگەر بینی جیوەیدا بەمرۆڤێك یان بوو بەخاوەنی یاخود لەدەستیابوو بەڵێنی خۆی کەداویەتی بەمرۆڤێك بەجێناهێنێت، ئەگەر خواردی بەو بەڵێن پشتگوێخستنە تاقیدەکرێتەوە.

**جیهـــاد( تێکۆشـــان ):** (ئـــیبن ســـیرین)دەڵێـــت: (ئـــیبن جـــریج) لـەـ(عطـاء)ەوە دەگێڕێتـەوە دەڵێـت: پێغەمبەرم (ﷺ)بینی لەخەودا وتم: ئەی پێغەمبەر پرسیارێکم هەیە، فـەرمووی: بیکە وتم: جیهاد باشە یاخود خۆبەستن لەپێناوی خوادا؟ فەرمووی: خۆبەستنو ئامادەباشـی، خۆبەسـتنو ئامادەباشـی باشترە لەبەندایەتی ساڵێك"[1].

(ئـەبو سـەعد) (رەزای خـوای لێبێـت) دەڵێت: لەپێغەمبەرەوە بۆیانگێڕاینەوە (ﷺ) فەرموویـــەتی: "کاســـبکارو رەنجـــدەر بـــۆ مـــاڵو منـــداڵ وەك

---

[1] (ترمذي) (١٦٦٧) و (النســائــي) (٣١٦٩) و(الدارمي) (٢٤٢٤) لەفەرموودەی (عوسمان)ەوە - رەزای خوای لێبێت - و تێدا هاتوە(هەزار رۆژ)و (سند)ەکەی (حسن)ە.

تێکۆشەروایە لەپێناوی خوادا، ئەگەر بینی تێدەکۆشێت لەپێناوی خوادا ئەوە هەوڵدەدات بۆ منداڵەکانیو خێرو بێری دەستگیر دەبێت"[٢]. بەپێی ئایەتی: ﴿يَجِدْ فِي الأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا﴾ (النساء:١٠٠).

*ئەگەربینی وەك ئەوەی لە (غەزوە)دایەو پشت هەڵدەکا لەکوشتار واز لەهەوڵدان بۆ منداڵەکانی دەهێنێتو پەیوەندییان لەگەڵدا دەبچڕێو ئاینی تێکدەچێت بەپێی ئایەتی: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ﴾ (محمد:٢٢).

*ئەگەربینی دەچێت بۆ جیهادو تێکۆشان سەرکەوتنو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت لەگەڵ پیاهەڵدانو پلەوپایەی بەرز بەپێی ئایەتی: ﴿وَفَضَّلَ اللهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾(النساء:٩٥).

*ئەگەر وابیبینی خەڵکی دەچن بۆ جیهادو تێکۆشان سەرکەوتنو زەفەر بردنو هێزو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت. هەروەها ئەگەربینی کوشتاری بێباوەڕاندەکات بەشمشێرێك بەتەنیاو بەڕاستو چەپدا هەڵیدەسوڕێنێ سەردەکەوێت بەسەر دوژمناندا، ئەگەربینی لەغەزوەکەدا سەرکەوت لەبازرگانیدا سوودو قازانجدەکات، ئەگەر جیهادی ئەنجامدا وەك ئەوەی گۆڕانکاری ئەنجامدەدات دەستکەوتو تالآنی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەربینی وەك ئەوەی لەپێناوی خوادا کوژراو شادیو ڕزقو ڕۆزی بەدەست دەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ، فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾ (ال عمران: ١٦٩ـ ١٧٠).

*ئازادکردن لەغەزوەدا ئاوەلآبوونی دەروازەکانی دنیایە.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر پەلەکردن لەبەدەستهێنانی بژێوی ماڵو منداڵداو ناوبانگو باسی باش بەدەستدەهێنێت.

*هەروەها وتراوە: جیهادو تێکۆشان بەڵگەیە لەسەر:

+ڕزقو ڕۆزی.

+گرتنەبەری ڕێگەی خێروچاکە.

+گفتوگۆ لەگەڵ خراپو سەرکەشاندا.

---

[٢](هەیسەم)ی لە (مجمع الزوائد)دا (٣٢٥/٤) هێناویەتی لەفەرموودەی (كعب)ی کوڕی (عجرە) بەم شێوەیەو وتویەتی: (طبراني) گێڕاویەتیەوە. لەهەرسێ (مسند)ەکەیدا پیاوانی (سند)ەکەی (صحيح)ە.

*ئەگەر ببینی لەپێناوی خودایا تێدەكۆشێت و لەگەڵ بێباوەڕاندا دەجەنگێت لەبۆ منداڵەكان بژێوی پەیدادەكاو، هەوڵدان و تێكۆشان و جیهادیش رزق و بژێوی پەیداكردنە.

*ئەگەر ببینی دەچێت بۆ جیهادو تێكۆشان موسوڵمانێكی تێكۆشەرەو نوێژدەكات و زەكاتی ماڵدەدات، تێكۆشان دژ بەدوژمنانی ئاین بەڵگەیە لەسەر بەرەبەركانی لەگەڵ ستەمكارو دووڕوان و سەركەوتن بەسەریاندا.

*جیهادو تێكۆشان لەدەریادا بەڵگەیە لەسەر هەژاری شكست و كەوتنە نێو دەردەسەری و ناسۆرییەوە گیرخواردن لەنێوان دوو دوژمندا: دەریاو دوژمن یاخود بەدووی رزق و رۆزی چوندا لەدەریادا یاخود ئەوەی دەریا بەڵگەیە لەسەری ..

*تێكۆشان دژ بەخراپەكاران بەڵگەیە لەسەر سەرخستنی ئاین یاخود پشتگیری باوك و دایك یا غیرەكردن لەهاوسەر.

*ئەگەر مرۆڤ لەكوشتاری خراپەكاران لایدا ترسی پاشگەزبوونەوەی لەئیسلام هەیە یاخود جووڵانەوە بەپێچەوانەی ویستی دایك و باوكەوە یاخود ئەوەی كەدەبێت گوێڕایەڵی بكات و وازهێنان لەنوێژكردن.

**ج ی**

**جێگە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: كەسێكە كاروباری ژنان دەگرێتەدەست.

*هەندێكدەڵێن: جێگەیەكی ناسراو هاوسەرەكەیەتی هەرچاكی و خراپەیەك چاكی و خراپیە بۆ خەوبینەر دەگەڕێتەوە جێگەیەكیتر.

*ئەگەر جێگەیەكی لەشوێنێكەوە دۆڕا بۆ شوێنێكیتر ژنەكەی لەحاڵێكەوە دەچێت بۆ حاڵێكیتر بەپێی جیاوازی نێوان ئەو دوو شوێنە.

*ئەگەر لەگەڵ جێگەكەدا جێگەیەكی تری بینی یاخود باشتربوو لەوەی خۆی یان خوارتربوو ژنێكیتر دەهێنێ بەپێی شێوەی ئەو جێگەیە.

*ئەگەر بینی جێگەكەی پێچاپەوەو خستییە لایەكەوە لەژنەكەی دووردەكەوێتەوە یان ژنەكەی لێدوور دەكەوێتەوەو خۆی لێدەپارێزێ.

*ئەگەر لەگەڵ جێگەدا شتێكی بینی بەڵگەبوو لەسەر جیاوازی و ناخۆشی یەكێكیان دەمرێ لەدور هاوسەر یاخود تەڵاق دەكەوێتە نێوانیان.

*ئەگەر جێگەیەكی نادیاری بینی لەشوێنێكی نادیارو زەوییەك

بەدەستدەهێنێ بەبێسیفەت و چۆنیەتی جێگەکە.

*ئەگەر جێگەیەکی نادیار یان ناسراوی لەسەر ڕەختێکی نادیاربینیو خۆی لەسەری دانیشتبوو دەستەڵات و پلەوپایەیە بەدەستدەهێنێو تێدا لەکەسانیتر بەرزتردەبێتەوەو زاڵدەبێت بەسەریدا.

*هەروەها ئەگەر بینی جێگەکەی لەبەردەرکی دەستەڵاتداردایە پۆستێك دەگرێتەدەست، ئەگەر جێگە بەژن لێکدرایەوە نەرمونیانی جێگە گوێڕایەڵییەتی بۆ مێردەکەی فراوانی جێگەش بەرینی ڕەوش و ڕەفتاریەتی.

*ئەگەر جێگەکە نوێبوو بەڵگەیە لەسەر گەرمو گوڕی.

*ئەگەر لەئاوریشمبوو ژنێکی ئاگرپەرستە.

*ئەگەر لەخوریبوو یان لۆکە بەڵگەیە لەسەر ژنێکی دەوڵەمەند.

*ئەگەر سپیبوو بەڵگەیە لەسەر ژنێکی ئاییندار.

*ئەگەر سافولووسبوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کاری ئەو ژنە پەسەندنییە لای پەروەردگار.

*جێگەی نوێ ژنێکی شۆخو شەنگو بەڕەوشتە.

*جێگەی دڕاوی پارچەپارچە ژنێکی بێدینە.

*ئەگەر خۆی لەسەر جێگەیەك دییەوەو خەوی نەدەهات دەیەوێت بچێتەلای ژنەکەی بەڵام بۆ نالوێت.

*ئەگەر بینی کەسێکیتر جێگەکەی دڕاندو لەت و پەتیکرد ناپاکیو خیانەتی لێدەکات لەبەرانبەر خانەوادەو هاوسەرەکەیدا.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر کەسێکیتر جێگەکەی دڕاندو لەت وپەیتکرد ناپاکیو خیانەتی لێدەکات لەبەرانبەر خانەوادەو هاوسەرەکەیدا.

*هەروەها دەڵێت: جێگە لەخەودا ژنە ، ئەگەر جێگەکەی خۆی فرۆشت ژنەکەی تەڵاقدەدات، ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێت.

*ئەگەر سەگێکی لەسەر جێگەکەی بینی یان بەرازێك داوێنپیسی دەستی لەگەڵ ژنەکەیدا تێکەڵکردوە.

*جێگە کچە یان پشوو ، نەرمی جێگە گوێڕایەڵی ژن بۆ مێردەکەیو وابەستەبوونیو فراوانی ڕەوشت بەرزییەتی، تازەییو خۆشی جێگەش کچێنیو گەرمو گوڕییەتی، ئەگەر ڕەشبوو کارێکدەکات خوداوەند پێی ڕازی نییە.

* جێگە بەڵگەیە لەسەر خزمەتگوزارو پاسەوانەکانی کۆشکو تەلار.
* ئەگەر بینی جێگەیەکی کڕیبوو ژنێکدەهێنێ.
* ئەگەر بینی جێگەکەی لەشوێنێکەوە گوێزراوەتەوە بۆ شوێنێکیتر ژنەکەی تەلاقدەدات.
* جێگەی نادیار لەشوێنێکی نادیار یاخود لەزەوییەك کەخەوبینەر دەچێتە نێوی بەپێی فراوانی ئەو شوێنەیە.
* جێگە بەڵگەیە لەسەر کوڕ.
* ئەگەر لەسەر جێگەکەی چاکی یان خراپی یاخود تەواوی کەموکوڕی بینی لێکدانەوەی لە بۆ ژنەکەیەتی.
* ئەگەر جێکەیەکی تری لەگەڵ جێگەی خۆی بینی ئەوە ژنیکیتر دەهێنێ.
* ئەگەر بینی لەسەر جێگەکەی هەڵدەستێ بۆ سەرجێگەیەکیتر لەهەموو شوێنێك لەژنەکانی هەڵدێت.
* ئەگەر بینی لەسەر جێگەکەی نوستبوو دڵنیادەبێت لەوەی لێیدەترسێ ، دەگونجێت بێئاگابێت لەئاینەکەی چونکە نووستن بێئاگاییە.

**جێگیری بڕیار:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا خاوەن کارێکەو بەڵگەیە لەسەر شوێنکەوتنی سوننەتی پیاوچاکان یاخود هەڵگرتنی شوێنەواری بیدعەکارانە.

# چیی



## چا

**چاپاڵێو:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: خزمەتکارێکی جوانو قەشەنگە.

**چادر:** لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+سەفەر.

+گۆڕ.

+ژن.

+ماڵو لانە.

*چادری زۆریش تەمو مژە.

*ئەوەی چادرێکی بۆ هەڵبدرێ ئەگەر فەرمانڕەوابێت دەستەڵاتی زیاد دەکات، ئەگەر سەربازبوو فەرمانڕەوایی و پۆستێك وەردەگرێ، ئەگەر بازرگانبوو سەفەر دەکاتو کیژێکی شۆخو شەنگو ڕێزدار دەکات بەهاوسەری.

*ئەگەر لەپاڵ چادرەکانیدا چادرێکی سپی بینی ئەوە پیاوێك فەرمایشت بەچاکە دەکاتو ڕێگری لەخراپەدەکات.

*ئەوەی لەنێو چادرەکەیدا مانگێك ببینێ حەز لەکچێکدەکات لەماڵی فەرمانڕەوادا.

*ئەگەر چادرێکی بینی هی خۆیبوو دەبێت بەسوارچاکی باش یاخود سەرکردە.

*چادر لەخەودا دەستەڵاتە بۆ یەکێك بچێتە نێوی یاخود لەپێناوی ئەودا هەڵبدرێ، ئەگەر شایستەی دەستەڵات نەبوو شکۆمەندیو ڕێزی دەستگیر دەبێت لەلایەن فەرمانڕەواوە.

*ماڵو لانەو گومەز بەدەر لەچادر لەگەڵ پەردەی سپی لەخەودا گۆڕی شەهیدانە، هەروەها چادری سەوزیش بەوچەشنەیە.

*ئەگەر لەچادرێك بێتە دەرەوە بەچەشنێ نەگەڕێتەوە نێوەی لەدەستەڵاتی بەدەر دەکەوێتو لەکاروپیشە لادەبرێت.

*ئەگەر بینی چادرەکانی گەمارۆدراون تەمەنی بەسەردەچێت‌و دەستەلاتی دەڕوات‌و گومەزیش ژنە.

**چادرفرۆش:** بینینی بەلگەیە لەسەر جموجووڵ‌و سەفەر.

*دەگونجێت بینینی بەلگەبێت لەسەر:
+گۆڕ.
+هاوسەرگیری کەسێکی رەبەن.

**چارۆکە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی چارۆکەی بۆ هەڵدراوە شکۆمەندی‌و رێز بەدەستدەهێنێت.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر دەستەلاتدارێك بینی خاوەن هێزو سوپایەو دڵنیادەبێت لەدوژمنێکی بەهێز کەخوازیاری دەستەلات‌و مەزنییەکەی بێت.

**چارۆکەفرۆشی کەشتی:** (نابلسی) دەڵێت: یەکێکە چارۆکەی کەشتی دەفرۆشێ، بینینی لەخەودا بەلگەیە لەسەر سەفەرو خۆئامادەکردن بۆ رزق‌و رۆزی هاوسەرگیری.

**چاککاری جل‌وبەرگ:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەلگەیە لەسەر فراوانی‌و رزق‌و رۆزی.

**چاکە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: چاکە بەلگەیە لەسەر قوتاربوون‌و سەرفرازی ئەوکەسەی خەوەکە دەبینێت.

(نابلسی)دەڵێت: بەلگەیە لەسەر چاکەو گەڕانەوە بۆ باشترین رەوشت‌وکردار، یاخود کردەوەی جوان‌و رێنموونی دوای وێڵی‌و سەرگەردانی .

**چاڵی بۆسەو پلان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی چاڵ هەڵدەکەنێ یاخود یەکێکیتر چاڵی بۆ هەڵدەکەنێ پلاندەگێڕێ یاخود یەکێکی‌تر پلانی لەدژ دەگێڕێ.

*ئەگەر بینی چوە نێو چاڵەکەوە دەستدەداتەوە پلان‌و فرۆفێڵ بەدەر لەکەسانیتر ، ئەگەر بینی چوەنێوی تا ئاسمانی لێدیار نەما دزو جەردە دەچێنە نێومالی‌و شتومەکی دەدزن ، ئەگەر لەسەر سەفەربوو رێگەی لێدەگرن.

*ئەگەر لەوچاڵەدا دەستنوێژیگرت بۆ نوێژ یاخود خۆیشت ئەوەی لێیان دزیوە بەدەستیدەهێنێتەوە یاخود قەرەبووی بۆ دەکرێتەوەو چاوی گەشدەبێت چونکە لەلێکدانەوەدا وەك ئاو وایە.

*ئەگەر لەو چاڵەی کەهەڵیکەندبوو هاتە دەرەوە یاخود ئاوی تێدا دەرهات‌و لەبەری رۆیی یاخود راوەستا بژێوییە لەفروفێڵدا بۆی بەدەستهاتوە.

**چاڵی دەغڵوداں:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دایکێکی پەروەردەکارو بژێویدەر.

*دەگونجێت چاڵی دەغڵودانی نادیار بەڵگەبێت لەسەر شوێنی کەلەبەر.

*ئەگەربینی رووخاوە یان تەپیوەو دایکی نەخۆشبوو دەمرێ، ئەگەر دووگیانێکی هەبوو رزگاریدەبێت و شوێنەکەی یەکدەگرێتەوە.

*ئەگەر خواردنەکی بینی بەچاوی خۆی زبڵ و خاک و خۆڵبوو نرخەکەی دادەبەزێ و ماڵ وسامانی تیادەچێت، ئەگەر خواردنی تێدا نەبوو پڕ لەزبڵ و خاک و خوێنبوو پاشان بەخواردن پڕیکردنەوە بەهانە وەردەگرێ، ئەگەر پڕ لەخواردنبوو هاوسەرەکەی دووگیاندەبێ بەمەرجێك هەژاربێت.

*ئەگەر لێیڕژاو خەڵکی پەرتەوازەبوون لێی و کەمیان کردەوە نرخەکەی هەرزاندەبێت.

*ئەگەر ئاگرێکی بینی کەوتە نێو خواردنەکەوە نرخگرانیەکی گەورە یان رووداوێك لەلایەن دەستەڵاتدارەوە بڵاودەبێتەوە یاخود سن و کوللەدەدات لەزەوی و زار، ئەگەر لەنێو خواردنەکەیدا خورماو شەکری بینی نرخەکەی گراندەبێ بەئەندازەی خۆشی خواردنەکە.

*ئەوەی دەکەوێتە نێو ئەو چاڵەوە یان نێو چاڵێکی نادیار وەك کەوتنە نێو بیر وایە.

**چاوئێشە( چاوگلگردن ):**(ئیبن سیرین) دەڵێت: چاوئێشە بەڵگەیە لەسەر پشتهەڵکردنی خاوەنەکەی لەحەق و تێکچوونی ئاینەکەی بەپێی چاوئێشەکە چونکە بەڵگەیە لەسەر کوێری و خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴾ (الحج: ٤٦).

*هەروەها دەڵێن: چاوئێشە بەڵگەیە لەسەرئەوەی نزیکە لەوەی کوێرببێ، ئەگەر چاوی وەك خۆی مایەوە لەئایندا بەکارێك تاوانبار دەکرێ پاك و بێگەردە لێی و بەمەش پاداشت دەدرێتەوە.

*چاوئێشە غەم و پەژارەیە پێیدەگات لەلایەن کوڕەکەیەوە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا گرانی بژێوییە یاخود بێئاگاییە، چاوئێشە کەم و کوڕییە لەئایندا، ئەگەر بینی هەردووچاوی تووشی ئێش وژانبوو باوك و دایکی نەخۆشدەکەوێ.

**چاوبڕینەئەستێرە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: چاودێری ئەستێرەکان بەڵگەیە لەسەر دەستەڵاتو پلەوپایە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی مەڕ دەڵەوەڕێنێ پیاوێکی عەرەبی دادەنرێت بەسەرکار.

**چاوبەست( فێڵ ـ تەڵەکە ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا لەخۆباییبوونو هەڵگیرساندنی فیتنەو ئاشووبە.

**چاوپاراستن ( چاوداگرتن ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پارێزگاری لەفەرمانەکانی خوداو یاساغەکانی بەپێی ئایەتی: ﴿ قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ﴾ (النور: ٣٠).

**چاوکز:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر چاوگرتن لەحەرامو تەماشانەکردنی تاوانبار یان حاڵو بار لاواز یاخود ئەوەی چاو بەڵگەیە لەسەری.
*دەگونجێت چاوکزی بەڵگەبێت لەسەر قاڵیو نەتوانین لەدووگیانیبوون یا هەڵگرتنی باردا.

**چاوەڕێکردن:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زانیاری بۆ خاوەن ئیجتهاد، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تێکدانی ئاین.

**چاوی مرۆڤ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: چاو ئاینو بەرچاوڕۆشنی پیاوە کەبەهۆیەوە دەڕوانێ و وێڵیو سەرگەردانییە.
*ئەگەر لەجەستەو لەشو لاری خۆیدا چەن چاوێکی زۆری بینی بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی چاکەی لەئایندا.
*ئەگەر بینی سکی شەقیبردو لەنێویا چەند چاوێکی بینینی زندیقە بەپێی ئایەتی: ﴿ مَا جَعَلَ اللهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ ﴾ (الأحزاب: ٤).
*ئەگەر بینی چاوەکانی چاوی مرۆڤێکی سەیرو نادیاربوو خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر کوێریو یەکێکیتر ڕێنومایی دەدات ، ئەوگەر پیاوەکە ناسرابوو ئەوە خەوبینەر کچەکەی دەدات بەشوو خێری لێدەستگیردەبێ.
*ئەگەر بینی چاوی لەدەستداو کوێربوو منداڵەکانی کۆچدەکەن.
*ئەگەر بینی هەردووچاوی کوێربوەو لەئاوارەییو غەریبیدایە بەڵگەیە لەسەر درێژبوونەوەی غەریبیو نزیکی لەمردنەوە.
*ئەگر بینی چاوەکانی ئاساییەو لەغەریبدایە بەڵگەیە لەسەر درێژبوونەوەی غەریبی هەتا مردنی.
*ئەگەر بینی چاوەکانی لەئاسنە غەمو پەژارە رووی تێدەکاتو دەبێتە هۆی ئابڕووبردنی.

*ئەگەر بینی چاوەکانی کردەوە بەرووی پیاوێکدا تەماشای کاروبارەکانیدەکاتو پشتگیریدەکات.
*ئەگەر بینی بەمۆڕبوونەوە تەماشایدەکات رقو خەشموقینی لێیەتی.
*ئەگەر بینی بەچاوی دەبیستیّو بەگوێچکەی تەماشادەکات هاوسەرو کچەکەی ناچاردەکات سەرپێچی بکەن.
*ئەگەر لەسەر شانی چاوی پیاوێکی بینی یان چاوی ئاژەڵێك ماڵو سامانێك بەدەستدەهێنیّ.
*ئەگەر بینی تەماشای چاوێکدەکاتو بەدڵیەتیو بەجوانی دانا کارێك ئەنجامدەدات زیان بەئاینەکەی دەگەیەنیّ.
چاوی رەش ئاینە، چاوی شینی ئاسمانی بیدعەیەو چاوی شینی ئاسایی واژووکردنی ئاینەو چاوی سەوز ئاینێکە پێچەوانەی ئاینەکانیترە.
*ئەگەر دڵی چاوی هەبوو یان خاوەنی چەندچاوێکبوو چاکسازییە لەئایندا بەئەندازەی رووناکیو نووری.
*ئەگەر بینی بەچاوی زینایکرد تەماشای ژناندەکات.
*ئەگەر بینی چاوەکانی گەنم رەنگن بەگومانەوە تەماشای ژنێکی هاورێدەکات.

*تیژی روانیین باشە بۆسەرجەم خەڵکیو لاوازی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێویستی بەخەڵکی هەیەو ماڵو سامانی دەبێت چونکە چاو وەك ماڵو سامان وایە.
*ئەگەر منداڵی هەبوو خەونێکی لەوچەشنەی بینی بەڵگەیە لەسەرئەوەی نەخۆشدەکەویّ چونکە منداڵ وەك چاو خۆشەویستە.
*(حەجاج)ی کوڕی (یوسف) لەخەودا بینی هەردوو چاوی کەوتە نێو کۆشیو پاشان هەواڵی مەرگی (محمد)ی برایو (محمد)ی کوڕی بیست.
*جوولەکەیەك کچێکی لەئاسمان بینی یان چاوی کچێك خەوەکەی بۆ (بەرهەمی) گێڕایەوەو ئەویش وتی: ماڵو سامان لەپیشەکەت بەدەستدەهێنێت.
*هەروەها دەڵێت: چاکیو خراپی چاو لەوەوە دەردەکەویّ چاو پێی گەشدەبیّ لەماڵو کوڕ یان زانیاریو لەشساغی.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر پیاوێکی گەنم رەنگی بینی پلاندەگێڕی بۆ دزی.
*ئەگەر بینی چاوەکانی کردەوە تەماشای حاڵو باریدەکاتو پشتگیریدەکات.

*ئەگەر بینی چاوەکانی لەئاسنە نهێنی خۆی دەشکێنیو غەمو پەژارەیەکی زۆر رووی تێدەکات.
*ئەگەر بینی بەچاو دەبیستیو بەگوێ دەبینێ ئەوە کاری دەویتی بۆ خانەوادەو کچەکەیدەکات.
*ئەگەر بینی بەچاو زینادەکات تەماشای ژناندەکات.
*ئەگەر تەماشای چاوێکیکردو بەدڵیبوو روو لەکارێکدەکات دەبێ بەتەوق بەسەریەوە لەئاینەکەیدا.
*ئەگەر لەسەر شانی چاوی بینی هی پیاوێك یاخود ئاژەڵێك ماڵێکی لەپەنهانو غەیبەوە دەستدەکەوێت.
*ئەگەر چاوی زەردبوبوو بەگومانەوە تەماشای ژنێکی هاوڕێدەکات.
*چاوی رەش ئاینەو چاوی شین واژووی ئاینو، شینی ئاسمانیش ئاینداریو بیدعەو چاوی سەوزیش ئاینێکە پێچەوانەی ئاینەکانیترە.
*ئەگەر هەژار یان زیندانیبوو بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی شەرو خراپە.
*ئەگەر تورەبوو بەڵگەیە لەسەرنەوەی مرۆڤێکی دێتەرێ دەستیدەگرێو لەوقەیرانەی تێدایە رزگاریدەبێ.

*ئەگەر کەسێك بینی لەسەر سەفەربوو یان لەسەفەردابوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی ناگەڕێتەوە بۆ نیشتمان.
*ئەگەر مرۆڤێك بینی سەد چاوی هەیە سەد درهەمەو گەر لەدەستیشدا بیبینێ بەو چەشنەیە.
*چاو بەچاودێر لێکدەدرێتەوەو پیاوێکە لەنێو کۆمەڵو هۆزی خۆیدا.
*چاو بەئاو لێکدەدرێتەوە.
*ئەگەر بێباوەڕێك ناتەواوی لەچاوی خۆیدا بینیماڵو کوڕەکەیەتی.
*ئەگەر بینی چاوەکانی گوێزرانەوە بۆ قاچیو پێوەی دەڕۆیشت پیاوێکە دوو خزمەتکاری هەیەو دووکچی خۆی دەدات پێیان.
*ئەگەر بینی چاوی پێکرا پیاوچاکەو کوڕی نییەو ماڵێك بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر بینی چاوی دەرهێنرا نەخۆشییەو تووشی دەبێت.
*ئەگەر بینی چاوەکانی چارەسەر دەکات ئاینەکەی چاکدەکات. بۆیەکێکیش چارەسەری چاوەکانی بکات وتراوە کوڕێکی دەبێتو وەجاخی رۆشندەکاتەوە، هەروەها دەڵێن: ئەگەر برایەکی ئاوارەو دوورخرابێتەوە دڵخۆشدەبێ بیبینێ.

*ئەگەر بینی بینایی یەك چاوەو بەهێزترە لەوەی خەڵکی گومانی پێدەبەن ، نهێنی لەئاینەکەیدا باشترە لەرەوشی ئاشکراو دیاری.

*ئەگەر بینی چاوەکانی لەخوار ئەوەوەیە کەخەلکی دەیبینن ئەوەش حاڵوباری پەنهانیو شاراوەیە لەئایندا.

*ئەگەر بینی چاوەکانی تانەیەکی لەسەرە غەمو پەژارە رووی تێدەکات یان جیادەبێتەوەو لەوکەسەی شیرینو خۆشەویستە لای.

*ئەگەر تانەیەکی بینی لەسەرچاویو پاشان لاچوو لەگەڵ کەسێکی ئاوارەدا دیسان یەکدەگرنەوە دوای ساڵانێکی دوورودرێژ، ئەگەر پەژارەداربوو خوداوەند غەمو پەژارەی دەرەوێنێتەوە.

*ئەگەر بینی تانەیەکی شین لەسەر چاویەتی تاوانبارە.

*ئەگەر بینی چاوێکی لەگەڵ چاوێکیتردا جووتبوە ئەگەر کوڕی هەبوو یان کچ با جێگەیان لەیەکجیابکاتەوە.

*ئەگەر بینی چاوی پیاوێك دەخوات ماڵو سامانی دەبات.

*ئەگەر بینی چاوەکانی برژانگیان نییە شەریعەی خواو بنەماکانی ئاین تیادەبات ، ئەگەر مرۆڤ خۆی هەڵکێشا دوژمنەکەی ئابرووی دەبات، ئەگەر بینی برژانگەکانی سپیبوون بەلگەیە لەسەر تووشبوونی نەخۆشیەك لەسەروچاوو گوێچکەدا.

*بینینی چاو لەلەشولاردا یان بینینی چەند چاوێك ئەگەر شیاوبێت بۆ چاوێکی ئاسایی بەلگەیە لەسەر ماڵ خوێنبایی تێدابێت.

*دەگونجێت بینینی چاوی جوان بەلگەبێت لەسەر جادوو مەرگو ژیان.

*دەگونجێت چاو بەلگەبێت لەسەر هەمووکەسوکارو خزمو منداڵو شوێنکەوتوان.

*دەگونجێت خواردنی چاو بەلگەبێت لەسەر هێلکەخواردن بەهێلکەورۆن.

*چاوی خوراو رزقورۆزییە.

*ئەگەر بینی چاوەکانی بیناییان لەدەستداو رێنوماییو زانیاری بەدەستدەهێنێ، ئەگەر کوڕی هەبوو یان هاوسەر یاخود خۆشەویستو ئازیز نەخۆشدەکەوێو چاکدەبێتەوە ، ئەگەر بێباوەڕبوو موسوڵماندەبێ ، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەنددەبێ ، وەگەرنا پلەوپایەی بەرز کەشیاوو گونجاوبێت بۆی بەدەستدەهێنێ.

*دەگونجێت چاوتێبڕینی بەڵگەبێت لەسەر ناڕەحەتیو ئەگەر چاوەکە لەجێی خۆی چوو بۆ بەشەکانی دیکەی بەڵگەیە لەسەر بەلاو نەهامەتی لەلەش‌ولاردا لەخوێن لێهاتن‌و کێم‌و زوخم دەردان یاخود کردنەوەی چاو لەلاشەدا.

*ئەگەر لەسەفەردابوو دەترساو تینوویبوو لەخەودا چەند چاوێکی بینیو هەڵیگرتەوە ئاوی دەستدەکەوێ‌و سوودی لێدەبینێ.

*ئەو چاوانەی لەبەرگەورەییو مەزنی باسناکرێ دەگونجێت چاودێری خودایی بێت.

*چاوکوێرکردن بەڵگەیە لەسەر داهاتنی سزای خوایی.

*ئەگەر چاوی کەوت بەسەر کەسێکداو شاراوەبوو لێی بەدیدەکات.

*ئەگەر ناتەواوییەکی لەچاویدا بەدیکرد دەگونجێت زیانێك روو لەقاچیبکات.

*چاوی راست بەڵگەیە لەسەر کوڕو هی چەپیش کچە.

*ریپۆقی چاو بەڵگەیە لەسەر بێداریو جیابوونەوە لەکەسێکی دڵخۆشکەر مەردوم شانازی پێوەدەکات.

*ئەگەر بینی چاوەکانی چوەتە گوێچکەی کوێردەبێ، پاشان هەموو ئەوشتانەی بەچاودەیبینێ بەگوێچکە گوێی لێدەبێ چونکە چاوی کوێر لەگوێچکەیدایە.

*ئەگەر سووراییەك لەچاویدابوو خەشم‌وقین لێی دەدات یان خنکان‌و هەناسەتوندی بەهۆی رووداوێکەوە.

*ئەگەر بینی چاوی دەرهێنراوە پاداشت دەدرێتەوە بەکاروفرمانی خۆی.

*ئەگەر هەردووچاوی دەرهێنرا کوڕە شیرینەکەی لێی دوور دەکەوێتەوە.

*چاودەرهێنان لەخەودا تەمەنێکی دوورودرێژە.

*دەگونجێت دەرهێنانی چاو بەڵگەبێت لەسەر کارەساتێك رووبکاتە چاوەکانیو ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ کەسانیتردا ئەنجامی دەدات دەگونجێت بگەڕێتەوە بۆ خۆی.

## چ ر

**چرا**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: بژێوی پەیداکاری ماڵە، ئەگەر بینی چرایەکی بەدەستهێنا زانیاریو بەرزیو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی بەدەمی چرایەك دەکوژێتەوە کاروباری پیاوێك بەتاڵ‌و پووچدەکاتەوە کەوا لەسەر حەق‌و راستییە بەلام بەتاڵ‌و پووچەڵ

نابێتــەوە، چـونکە لەسـەر حــەق‌و ڕاستییە بەپێی فەرمایشتی خوداوەند:
﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللهُ مُتِمُّ نُورِهِ ﴾ (الصف: ٨).

*ئەگەر بینی بەڕۆژ چرای هەڵگرتووە زۆر پەیوەستدەبێ بەئاین‌و ڕێبازێکی ڕاســت‌و ڕەوانــەوە بــەپێی ئایــەتی:
﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ نُوراً تَمْشُونَ بِهِ ﴾ (الحديد: ٢٨).

*ئەگەر بینی بەشەو دەڕوات‌و چرایەکی بەدەســتەوەیە تێدەکۆشــێ، ئەگــەر لەتێکۆشەرو تەلاشداران بێت، وەگەرنا ڕوو لەکارێکدەکات سەرسامدەبێت تێدا چونکە تاریکایی سەرسامییەو ڕووناکی ڕێنمایییە،دەگونجێت لەسەرپێچیدابێت‌و پاشان تەوبەبکاو پاشگەزبێتەوە.

*ئەگــەر بینــی چــرایەک لــەنێو پەنجەکانیــەوە تیــشک‌و ڕوونــاکی دەدەنــــەوە یــــاخود لەهەنــــدێك لەئەندامەکانیــەوە بــاس‌و خواســێکی نادیــاری بــۆ دەردەکــەوێ‌و بەڵگەیــە لەسەر تەواوی‌و دڵنیایی‌و سوودی.

*ئەگــەر بینــی چــرایەکی هەیــە دەســتەلاتدارو فــەرمانڕەوا یــاخود زانایەك دێتە لای یان ڕزق‌و ڕۆزییەکی پیرۆزی دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر بینی چرایەکی هەیەو تیشك‌و ڕووناکی وەك تیشك‌و ڕووناکی ڕۆژوایە قورئـانی پـیرۆز لەبـەردەکات‌و پاشـان ڕاڤەیدەکات.

*چـرا زیـادبوونی نـورو ڕووناکی دڵەو هێــزو تینــی ئاینــەو بەدەســتهێنانی ویست‌و خوازە.

*چـرا کـوڕێکی پـیرۆز خواناسـە یـان بازرگانێکی دەست‌و دڵفراوانە.

*ئەگــەر بینــی چـرا یـاخود مۆمێك یـا پزیــسکێ ئــاگری بەدەســتەوەیەو کوژایەوە ئەگەر دەستەلاتداربێ لەسەر کــار لادەبــرێ ، ئەگــەر بازرگــان بێــت زەرەر دەکات، ئەگەر خـاوەن زێڕبێت ماڵ‌و سامان‌و زێڕی تیادەچێت بـەپێی ئایــەتی: ﴿ مَــثَلُهُمْ كَمَثَــلِ الَّــذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَــبَ اللهُ بِنُــورِهِمْ وَتَــرَكَهُمْ فِـي ظُلُمَاتٍ لاَّ يُبْصِرُونَ﴾ (البقرة: ١٧).

*چـرا لەماڵدا بـۆ کەسـی ڕەبـەن ژنـە دەیکـات بــە هاوســەری خــۆی‌و بــۆ نەخۆش چاکبوونەوەیە.

*ئەگــەر تیـشکەکەی ڕوونـاك نــەبوو بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارە.

*هــەموو چــرایەك بەڵگەیــە لەســەر دەرکــەوتنی شــتی نادیــارو پــەنهان‌و فتیلــــەش کەســـێکە خزمـــــەتی

خەڵكيدەكات، يان كەيبانووى ماڵە ، ئەگەر بينى هەمووى سووتا كەيبانووى ماڵ دەمرێت.
*ئەگەر بڵێسەى ليكەوتەوەو لەپلێتەكەىو سووتا هەڵەيەكدەكاتو قاچى هەڵدەخليسكێ.
(نابلسى) دەڵێت: چرا بۆنەخۆش ژنو هاوسەرە، ئەگەر كوژايەوە نەخۆشەكە دەمرێت ، ئەوەى چرايەك چاكبكاتو دايبگرسێنێتو نەخۆشى هەبێت نەخۆشەكەى چاكدەبێتەوە.
*چراى بچووك كەتيشكەكەى لاوازوكزە بۆ هەڵگرى كچە.
*هەروەها دەڵێن: چرا بەڵگەيە لەسەر دەركەوتنى شتى پەنهانو شاراوە.
*ئەگەر چراى ماڵەكەى بينى داگيرساوەو تيشكو رووناكيدايەوە چاكى بژێوى پەيداكارى ماڵە.
*ئەگەر بەلاوازى بينى حاڵى بژێوى پەيداكارى ماڵەكەى سستو كزدەبێت.
*ئەگەر بينى چراكەى كوژايەوە تێكەڵبوونى كاروبارى بژێوى پەيداكارى ماڵە لەگەڵ خراپى حاڵو بارى.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مردنى ياخود مەرگى كورەكەى يان دايكو باوكى يان كەيبانوو يا بژێوى پەيداكارى ئەو ماڵە ئەگەر لەخەوەكەدا بەڵگەيەكى تێدابوو لەسەر ئەوە، ياخود دەگونجێت مەرگى هاوسەرەكەى بێت.
*ئەگەر چرايەكى بەدەستى خۆيەوە بينىو ترسا بكوژێتەوە بەڵگەيە لەسەر مردنى نەخۆش.
*ئەگەر نەخۆشێكى بينى بەچرايەكەوە روو بەسەرزەوى رووحەكەيەتى روو بەئاسمان بەرزدەبێتەوە.
*ئەگەر چرايەكى بەدەستهێنا زانيارىو شكۆمەندى بەدەستدەهێنێت.
(ئيبن سيرين) دەڵێت: كورێكى شانو شەوكەتدارو پلەوپايەبەرزو بەسوودە ئەگەر لەكاتى خۆيدا هەڵبگيرسێ، ئەگەر داگيرسابوو بژێوى پەيداكارى ماڵو زانايە.
*چرا لەمزگەوتەكاندا زانا ياخود قورئانخوێنو دنيا نەويستە.
*(ئەبوعويەينە) دەڵێت: بينيم چراى مزگەوتەكان كوژانەوە ئنجا (مەسعەرى كورى كدام) مرد.
(نابلسى) دەڵێت: لەخەودا كورِ يان مێردە ، ئەگەر لەوجۆرە چرايانەبوو دەرچەى نەبوو ژنو مێردەو كورِيان نابێت.
*چرا بەڵگەيە لەسەر:
+زانيارى.
+تەوبەى سەرپێچيكار.

+ڕێنومایی بێباوەڕ.
*دەگونجێت چرا ڕاڤەکاری خەوبێت یان بەڵگەی کاروان بێت چونکە ڕێنومایی کاروانبەڕاندەکات.
*چرا ژنەو فتیلە منداڵانەو چرا بەبێ فتیلە سوودی نییە.
*هەروەها چرا بەئەستێرە لێکدەدرێتەوەو شکاندنی چراو کوژاندنەوەی مەرگی نەخۆشە، ئەگەر مرۆڤێك لەئاسمانەوە ئەستێرە وەربگرێ لەمزگەوت چرا دەهێنێت.
**چراخان:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پیاوێکی ڕاچەسپاو دووربینەو داهاتوو دەبینێت.
*ئەگەرببینی چراخانەکە کەوتەخوارەوە ئەو ئاژەڵە دەمرێت و بەرووبووم تیادەچێت.
*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر مردن بەهۆی ئەومانایەی ناوەکەی هەڵیگرتووە.
(نابلسی)دەڵێت: هەر پیشەسازێ ببینێ بەڵگەیە لەسەر ساختەی ئەو کەلوپەلەی دروستیدەکات.

**چ ق**

**چەقڵ( درك ):** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی کرداری چاکە ئەنجامدەدات تەوبە دەکات لەو خراپەیەی ئەنجامیداوە، یاخود پەیوەندی خزمایەتی بەجێدەهێنێت یاخود خێر لەگەڵ نەدارو هەژاردا دەکات.
*ئەگەر دانیشتوانی وڵاتەکەی بینی ناندەدەن بەهەژاران یاخود چاکە ئەنجام دەدەن و یادی خواو نوێژدەکەن، ئەگەر لەناڕەحەتی و ئاڵۆزیدابوون خوداوەند دەروویان لێدەکاتەوە بەوەی دەگەڕێنەوە بۆلای خوا.
*ئەگەر بینی زۆر یادی خوادەکات میراتی بۆ بەجێدەمێنێت.
*ئەوچاکەیەی مرۆڤ لەخەودا ئەنجامیدەدات لەلابردنی زیانبەخش لەسەرڕێ و فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە بەڵگەیە لەسەر:
+سوودو قازانج لەبازرگانیدا.
+قەرزدانەوە.
+دڵنیابوون لەترس وبیم.
*بەخشینی چاکە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر لابردنی ستەمکاران و دانانی دادپەوەران.

**چ ل**

**چڵك و پیسی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: چڵك و خەوش و پیسی بەسەر لەش و

لارەوە یـــان رووەوە زۆری گونـــاهو رووتانەوەی مووی لەش‌و لارو رۆیشتنی ماڵ‌و داراییە.
(نابلسی) دەڵێت: چڵك‌و پیسی بەڵگەیە لەسەر:
+ئاین.
+نەخۆشی.
+سەفەر.
*هەروەها چڵك‌و پیسی بەڵگەیە لەسەر هاوتاو تاك یاخود داپۆشینی هەموو شتێکی دەگمەن‌و ناوازە.
**چلم:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی فنگدەکات قەرزەکەی دەداتەوە یاخود لەغەم‌و پەژارە قوتاردەبێ بەشێك پاداشت دەدرێتەوە بەشتێك کەئەنجامیدەدات.
*هـــەروەها دەڵـــێن: چـــڵم بەڵگـــەی لەدایکبوونی کورە.
*ئەگەربینی چڵمی فرێدایە سەر زەوی کچێکی دەبێت.
*ئەگـــەر چـــڵمەکەی کـــرد بەســـەر هاوســـەرەکەیدا دووگیانـــدەبێ‌و دواتـــر لەباریدەچێ، ئەگـــەر ژنەکـــەی چڵمیکرد بەســـەرا کـــوڕێکی دەبێـــت یـــان منـــداڵ لەشیر دەبڕێتەوە.
*ئەگەر لەپاڵ پیاوێکدا فنگیکرد ژنێك دەهێنێ بەحەلاڵی یان حەرامی.
*ئەگـــەر لەســـەر جێگـــەی پیاوێـــك فنگیکرد ژنەکەی دەترسێنێ.
*ئەگـەر لەدەستەسڕەکەیدا فنگیکـرد ئـەوا لەگـەڵ خزمەتکارەکەیـدا ناپـاکی لەگەڵدەکات.
*ئەگـــەربینی فنگـــدەکات‌و ژنێـــك چڵمەکەی وەردەگرێ فێڵی لێدەکات‌و دووگیاندەبێ لێی.
*ئەگەر بینـی چڵمی کەسێك دەسڕێ پیاوێـــك ژنەکـــەی فریـــودەدات‌و هەوڵدەدات داپیۆشێ بەڵام بۆی ناکرێ.
*ئەگـەربینی چـڵمی خـۆی دەخـوات ماڵی کوڕەکەی دەخوات.
*ئەگـــەر چـــڵمی لەلووتیـــدا بینـــی خەونەکـەی بەڵگەیەلەسـەر دووگیـانی ژنەکەی.
*ئەگەر بینی پژمی‌و ئاژەڵێك لـەلووتی هاتـــەدەرەوە کـــوڕی کەســـێکیتری دەدرێتـــەپاڵ ، ئەگـــەر ئـــەوەی هاتـــە دەرەوە پشیلەبوو کوڕێکی دز دەبێت، ئەگەر کۆتربوو کچێکی خۆشەویستە.
*ئەگـــەر چـــڵم بەلێـــشاو لـــەلووتی هاتەدەرەوە منداڵی بەگوماندەبێ.

*ئەگەر کەسێکی بینی فنگیکردە جلەکانی دەبێت بەزاوای.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر فنگیکردو بولبولێك لەلووتی هاتە دەرەوە کوڕێکی قورئانخوێنی دەبێت.
*ئەگەر بینی چڵمی دەسڕێ منداڵی زۆری دەبێت.
*ئەگەر بینی فنگدەکات کوڕێکی دەبێت لەژنێك بەئەندازەی ئەو شوێنەی فنگی تێداکردوە ئەویش لەژن دەبێ. ئەگەر لەلای ڕاستی فنگیکرد منداڵەکەی کوڕدەبێ، ئەگەر لەلای چەپی منداڵەکەیبوو کچ دەبێت، ئەگەر کەسی دووگیان نەبوو نەیدەویست هاوسەربگرێ زەکاتی ماڵەکەی دەدات یاخود پارە خەرجدەکات بۆ ژنان یان وەسیەتەکەی جێبەجێدەکات.
*چڵمو ئەوەی لەلووت دێتە دەرەوە یا وەك ئاو وایە ئاگادارییە بەنەخۆشکەوتن یان ڕووداوو کارەساتێك، ئەگەر چڵمبوو بەڵگەیە لەسەر ماڵوساماننو ئەگەر خواردی پێویستی بەقەرز یان ماڵی گوماناویدەبێت.



**چنار:** (نابلسی) دەڵێت: دارچنار لەخەودا پیاوێکی خاوەن بەرزو بڵندو منداڵدارەو هیچ سوودێکی تیا نییەو ڕەقیشی چاکەیەو ڕەگەکانی بنەچەو بناغەیە، ئەوەی لەبەربوومەکەی بەدەستبهێنێت ماڵو دارایی لەپیاوێکی هاوچەشنی بەروبوومی بەدەستدەهێنێت.
*دڕکیش تێدا ئەگەر چوو بەگیانو دەستیدا خراپە.
*هەروەها دەڵێن: داری چنار بەڵگەیە لەسەر خێرو چاکە بۆیەکێك ئەگەر بیەوێت بچێت بۆ جەنگو شەڕ، بۆسەرجەم خەڵکیش بەڵگەیە لەسەر هەژاریو نەداری.

**چنگو نینۆکی باڵندە:**

(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پاشگەزبوونەوە لەئاینو نواندنی ڕەفتاری خراپەکاران یان ماڵو سامان خەرجکردن یاخود شکانی بەڵێنو پەیمان.

**چنەر:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ماندبوونو هیلاکی بەهۆی قسەو وتەوە.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر چاندن بۆ کشتوکاڵو خەرجی بەروبوومو هاوسەرگیریو وەچە.

## چ و

**چواله(بادەم)**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: چواله ماڵوسامانه، خواردنی بەدەستهێنانی ماڵوسامانه بەشەڕو ئاژاوە.لێکردنەوەشی لەدارەکەی بەدەستهێنانی ماڵوسامانه لەپیاوێکی ڕژدو بەخیلەوە.

*داربادەم پیاوێکی ئاوارەی نامۆیەو بادەمی شیرینو خۆش بەڵگەیە لەسەر تاموچێژی باوەڕ، تاڵیش بەڵگەیە لەسەر قسەی حەقو ڕاستی.

*ئەگەر بینی توێکڵە بادەم کرا بەسەریا جلوبەرگو پۆشاك بەدەستدەهێنێ.

*هەروەها وتراوە: چوالەی وشك بەڵگەیە لەسەر قاوقیژو دەنگەدەنگ بەهۆی تەق تەقی بەریەککەوتنیو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر غەموپەژارە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسە ڕەواندنەوەی نەخۆشیو پەرێزگرتنو بەسەرچوونی دەستەڵات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مردوو لەکفنەکەیدا یان نەفسی خۆی یاخود گۆڕەکەی مەگەر چوالەکە سەوزبێت ئەگەر لەکاتی خۆیدا بێت بەڵگەی خێرە.

*چوالەی شیرین بەڵگەیە لەسەر ماڵوسامانی حەڵاڵ بەپێی زۆروکەمی، ئەگەر بینی لێی دەخوات ڕزقو ڕۆزی بەشەڕو ئاژاوە دەستگیر دەبێ.

*ئەگەر لەگەڵاکانی خوارد ماڵێکی ئاسان لەپیاوێکی دەستەڵاتدارەوە بەدەستدەهێنێ.

## چ وو

**چوون بۆ (حەج)**: (نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی چوو بۆ (حەج) لەغەمو پەژارە قوتاردەبێت.

*ئەگەربینی لە(منی)نوێژدەکات لەحەجداو وتاردەداتو خۆشی شایستەی ئەوەنەبوو کەسی نێو خانەوادەکەشی شایستەی ئەوە نییە بۆیە لێکدانەوەی خەونەکەی بۆ خەڵکی هاوچەشنی خۆیەتی، ئەگەر هیچکام لەوانە نەبوو بەڵاو نەهامەتی ڕووی تێدەکاتو ناوبانگی پێدەردەکات.

*ئەگەر وتاریداو وتارەکەی بەهێزو باشبوو قسەکانی تەواوکردو خەڵکی تەماشایاندەکردو بێدەنگبوبوو نوێژەکەی تەواوکرد لەسەر شێوەوباری خۆی دەستەڵاتێك بەدەستدەهێنێو خەڵکی ملکەچی دەکەن، ئەگەر وتارو

وتوێژەکەی تەواو نەکردبوو دەستەڵاتەکەی تەواونابێ لادەبرێ.

**چوونەسەرئاو:** چوونەسەرئاوو میزکردن لەخەودا غەمو پەژارە رەوینەوەیە ، ئەگەر خاوەن ماڵوداراییبوو ماڵەکەی پاکدەکاتەوە.

*ئەگەربینی پیساییەکەی زۆربوو لەهەمانکاتدا دەیویست سەفەربکات سەفەرەکەی بۆسەرناگرێتو رێگەی لێدەگرن.

*ئەگەربینی پیسایی رەقدەکات ماڵوسامانی بەلەشساغی خەرجدەکات، ئەگەر پیساییەکەی شلبوو سەرجەم ماڵەکەی دەبەخشێ.

*ئەگەر شوێنی سەرئاوەکەی ناسراوبوو خێرەکەی لەپێناوی ئارەزووی خۆیدایە، ئەگەر نادیاربوو لەرووگەیەکی نادیاردا خەرجیدەکاتو دەیبەخشی بەیەکێك ماڵی حەلاڵو حەرام لەیەك جیاناکاتەوە.

*ئەگەر لەشوێنێکدا پیساییکردو بەخۆڵ دایپۆشی ماڵو سامانەکەی دەشارێتەوە.

**چوونە نێو ماڵو شتیتر:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا دەچێتە نێو ماڵی پیاوێکەوە لەدنیادا زاڵدەبێت بەسەریا.

*ئەگەر بینی دەچێتە نێوماڵی پێشەواو تێدا نیشتەجێدەبێتو دڵنیادەبێت خۆی هەڵدەقورتێنێ لەکاروبارە تایبەتیەکانی.

*هاتنی پێشەوایەکی دادپەروەر بۆ شوێنێك دابەزینی فەرو خێرە لەگەڵ دادپەروەریی.

*ئەگەر پێشەوایەکی ستەمکاربوو تێکچوونو بەڵاو نەهامەتییە، ئەگەر راهاتبوو بچێتە نێو ئەو شوێنە زیانی پێناگات.

*ئەگەر بینی دەچێتە بەهەشت پشت بەخوا دەچێتە نێوی ئەوەش مژدەیەکە بۆ ئەو بۆ ئەوەی پێشکەشیدەکات بۆ خۆی یاخود بۆ کەسێکیتر.

*ئەگەر بینی دەچێتە نێو دۆزەخو پاشان لێیدێتە دەرەوە ئەمەش بۆ کەسی گوناهکاری گەورە ئاگادارییە بۆئەوەی تەوبەبکاتو پاشگەزببێتەوە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بچێتە نێو دۆزەخ ئەگەر بێباوەڕ یان باوەڕداربێت لەرزوتا تێدەکاتو هەژار دەکەوێتو زیندانی دەکرێت.

*ئەگەر کەسێکی بازاڕیبوو گوناهێکی گەورە ئەنجامدەدات یان تێکەڵدەبێت لەگەڵ کەسانی بێباوەڕدا.

*هەروەها دەڵێن: چوونە نێو بەهەشت بۆ حاجی بەڵگەیە لەسەر تەواوبوونی

حەجەکەی و گەیشتنی بەکەعبە، ئەگەر بێباوەڕبوو باوەڕ دەهێنێت ، ئەگەر نەخۆشێکی باوەڕداربوو لەو نەخۆشیەدا دەمرێت، ئەگەر بێباوەڕبوو لەنەخۆشییەکەی چاکدەبێتەوە، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت و میراتیەکی بۆ دەمینێتەوە.

*ئەگەر چوە نێو ماڵ و لانەیەکی نادیار بەتایبەت ئەگەر مردووی تێدابینی دەیناسێن قیامەتەو ئەو کەسە دەمرێت.

*ئەگەر چوە نێوی و هاتەوە دەرەوە لێی نزیکدەبێتەوە لەمەرگ و پاشان قوتار دەبێت لێی.

*ئەگەر خۆی لەقیامەتدا ببینێتەوە ئەوکەسە لەبێداریدا نەخۆشبێت بەپاک و پارێزراوی لەفیتنەو ئاشوبەکانی دنیاو روو بەقیامەت دەچێت ، ئەگەر نەخۆشبوو مژدەیە بۆی بەئەندازەی کاروکرداری لە(حەج) و تێکۆشان و دنیانەویستی و بەندایەتی و زانیاری و پەیوەندی و ئارامگرتن لەسەر سەرپێچی و یاخیبوون.

*ئەگەر بینی دەچێت روو بەقیامەت و دەیبینێ ئەو خەونە بۆ یەکێك رەوشتبەرزبێت و بەزانیاری و تواناوە ئەو کارە ئەنجامبدات بەڵگەیە لەسەر پووچی و خراپی، ئەوەی بترسێ و تاوانبار بێت یاخود غەم و پەژارەداربێت ترس و بیم و غەم و پەژارەکەی دەڕەوێتەوە، بۆسەرجەم خەڵکی بەڵگەیە لەسەر سەفەرو دورکەوتنەوە لەنیشتمان.

*ئەگەر بینی لەقیامەت گەڕاوەتەوە دوای ئەوەی دەچێتە نێوی لەغەریبی دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمانی خۆی، ئەگەر دوورکەوتەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەغەریبی دەمێنێتەوە.

*چوونە نێو شاری (مەککە) لەخەودا تەوبەیە، بۆ کەسی بێباوەڕ موسوڵمانبوونەو بۆ رەبەنیش هاوسەرە.

*ئەگەر خەوبینەر بەربەرەکانیدەکرد بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتنی لەبەربەرەکانیەکەیدا.

*چوونە نێو شاری (مەککە) بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی لەترس و بیم.

*ئەگەر بینی دەچێتە نێو (مەقامی ئیبراهیم) (سەلامی خوای لێبێت) ئەگەر ترسی هەبوو دڵنیادەبێت.

*دەگونجێت چوونە نێو (مەقامی ئیبراهیم) (سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەبێت لەسەر پلەوپایەیەکی شکۆدارو بەرێز وەك دەستەلات یاخود

بڵاوکردنەوەی زانیاری، یان میراتییەك لەباوكو دایکییەوە بۆی بمێنێتەوە.

*چوونە نێو ماڵو مزگەوتی حەرام بۆ کەسێك هاوسەری گرتبێ بەڵگەیە لەسەرئەوەی بەیاوەری هاوسەرەکەی دەچێتە نێو ماڵی خۆی.

*دەگونجێت چوونە نێو (بیت الحرام) بەڵگەبێت لەسەر گرتنەخۆی حەزو ئارەزوو رووکردنە حەرام وێڕای تواناداری بۆ حەڵاڵ بەتایبەت ئەگەر نوێژی تێدا نەکرد یاخود عەورەتی دیاربوو.

*چوونە نێو مزگەوتی (حرام) بەڵگەیە لەسەر:

+ئەمنو دڵنیایی.

+راستگۆیی.

+چوونە نێو بازاڕو هەوڵدان بۆ پەیداکردنی بژێوی.

*چوونە نێو ماڵ بەمەبەستی هاوسەرگیری.

*چوونە نێو مزگەوت پاشگەزبوونەوەیە لەگوناهو تاوان.

*چوونە نێو کەنیسە تێکچوونی ئایینە.



**چۆلەکە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: چۆلەکە پیاوێکی گەورەی مەترسیداری سستی خاوەن ماڵو سامانەو زیانی هەیە بۆ سەرجەم خەڵکیو قۆڵبڕە لەکاروبارەکانیداو سەرۆکایەتیشی بەباشی پیادە دەکات.

*هەروەها دەڵێن: چۆلەکە ژنێکی جوانی بەسۆزو بەزەییە یاخود پیاوێکی ئارەزووبازی خاوەن چیرۆکەو خەڵکی پێدەکەنن پێی.

*هەروەها دەڵێن: کوڕێکی نێرینەیەو ئەوەی ببێت بەخاوەنی کۆمەڵێ چۆلەکەی زۆر دەبێت بەبەرپرسی کۆمەڵێکی مەترسیدار .

*هەروەها دەڵێن: باڵندە وتەیەکی باشەو مریشکی کڵاوەبەسەریش کوڕێکی بچووکە.

*هەروەها دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم تۆشەبەرەیەکم پێیەو راوی چۆلەکە دەکەمو باڵەکانیان دەکوتمەوە دەیانخەمە نێو توێشەبەرەیەکەوە (ئیبن سیرین) وتی: تۆ مامۆستای حوجرەیتو یاریدەکەیت.

*هەروەها دەگێڕنەوە پیاوێك هات بۆلای (ئیبن سیرین) و تی: تەوبە بکە تۆ پارەیەکت بۆ خۆت بەکارهێناوەو بۆ تۆ حەڵاڵ نییە، پیاوەکە وتی: پەنا بەخوا چۆن شتێك دەبەم کەهی خۆم نەبێ، (ئیبن سیرین) یش وتی: ئەگەر بتەوێت بڕی ئەو پارەیەشت پێدەڵێم

کەبردوتە، وتی: چەندە؟ وتی: شەش درهەمە، پیاوەکە وتی: چۆن زانیت؟ وتی: چونکە ئەندامەکانی چۆلەکە شەشن و بۆ هەر ئەندامێك درهەمێك.

*هەروەها پیاوێك هات بۆ لای (ئەبوبەکری صدیق) (رەزای خوای لێبێت )و وتی: لەگیرفانمدا چەن باڵندەیەکی زۆرم بینی لەگەڵ چۆلەکەداو یەك لەدوای یەك دەرم دەهێناو دەم خنکاندو فرێمدەدا، ئەویش وتی: تۆ پیاوێکی دەلاڵی و لەخوابترسەو تەوبە بکە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی چۆلەکەیەکی سەربری کورێکی لاوازی دەبێت و ترسی مردنی دەبێت.

*دەنگی باڵندەکانیش بەڵگەیە لەسەر قسەو وتەیەکی باش یاخود رۆچوون لەزانیاریدا.

*باڵندەی زۆر ماڵ و دارایی بەبێماندوبوون بۆ یەکێك بیگرێتە خۆی.

*هەروەها چۆلەکە بەمندالان لێکدەدرێتەوە ئەگەر چۆلەکەیەکی بەدەستیەوە بینی دە دینار بەدەستدەهێنی و چۆلەکەش پیاوێکی مەزن و پلەوپایەدارە.

*ئەگەر بینی چۆلەکەیەکی گرت یا بوو بەخاوەنی زاڵدەبێت بەسەر پیاوێکی پلەوپایەداری گەورە ، هەروەها ئەگەر بینی راویدەکات هەر بەو چەشنەیە.

*ئەگەر بینی سەریدەبڕێ خواست و ویستی بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی پەڕەکانی هەڵکێشا یان لەگۆشتەکەی خوارد ماڵ و سامانی لێدەست دەکەوێت ئەگەر مێینەبوو ژنەو بەو شێوەیەیە.

*ئەگەر بینی چۆلەکەیەك سەردەبڕێت کچێك لاقە دەکات.

*ئەگەر بینی زەرنەقوتەی چۆلەکەیەك سەردەبڕێت کچێك لاقە دەکات.

*ئەگەر زەرنەقووتەی چۆلەکەیەکی بەدەستهێنا کورێکی دەبێت دەگات بەئاستی پیاوە گەورەو ناودارەکان.

*ئەگەر بەدەستییەوە یان لەنێو قەفەسدا چۆلەکەی بینی ، پاشان فڕی و نەگەڕایەوە بۆ لای کورە نەخۆشەکەی دەمرێت.

*ئەگەر بینی چاوی چۆلەکە دەدورێتەوە فێڵ لەمنالاندەکات و دەستیاندەبڕێ.

*ئەگەر بینی زەرنەقووتەی بەدەستهێنا منداڵی زۆریدەبێ.

*ئەگەر بینی چۆلەکەیەك خۆیکرد بەگەروویدا ئەگەر کوڕی هەبوو دەکەوێتە نێو بیرێکەوە.

**چۆلەكەى سەرسوور:** (ئيبن سيرين) دەڵێت: چۆلەكەى سەرسوور ژنە يان كچە ياخود مندالّ يان مالّو داراييە.

**چۆڵەوانى:** (نابلسى) دەڵێت: لەخەودا نەسازانى خانەوادەى مالّيكە، بەپێى فەرموودەى :"چۆڵترين مالّ ئەوەيە كەوا دۆستايەتىو خۆشەويستى تيانەبێت"[1].

*دەگونجێت چۆڵەوانى بەلگەبێت لەسەر غەمو پەژارە.



**چەپك(قول ـ دەسك):** (نابلسى) دەڵێت: لەخەودا بەلگەيە لەسەر كەفارەتى سوێند، دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر مالّو دارايى كۆكردنەوە لەرێگەى خۆيەوە يان لەرێگەيەكى ترەوە.

**چەپەرى دەرگاو مزگەوت:** (نابلسى) دەڵێت: لەخەودا بەلگەيە لەسەرئەوەى مرۆڤ دەيپۆشێو لەبەريدەكاتو خۆى پێدەرازێنێتەوە ياخود ئەو مالّو داراييەيە حالّو بارى پێدادەپۆشێ.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر:

+باى نێو سك.

+بلاّوكردنەوەى قسەوباس.

[1](ترمذي) (١٨٤٢)و (ئيبن ماجه) (٣٣١٨) هێناويانە.

+ژنى جوانو قەشەنگو شۆخو شەنگ هەموو تايبەتمەندييەكى تيايە، ياخود پياوێكى لەو چەشنە.

*ئەگەر چەپەرێكى بۆ خۆى كرى بەلگەيە لەسەر هاوسەرگيرى لەگەلّ خزمەتكاردا، ئەگەر خۆى لەژێريدا بينى لەژێر خراپەوكارى نابەجێدايە.

*ئەگەر نەخۆشێكى بينى هەلّياندەگرت لەسەرى دارەمەيتەكەيەتى.

**چەتر(سەيوان):** (نابلسى) دەڵێت: ئەگەر بينى چەترى بۆ كۆمەڵێك هەلّدا دەستەلاّت وەردەگرىّو توانای پێەودەبىّ.

*ئەگەر بينى چەترێكى هەيە يان كونێك لەزەويدا شەهيددەكرىّ.

*چەتر فەرمانڕەوايە، ئەگەر پێچايەوەو لايبرد دەستەلاّتەكەى لەناودەچىّو تەمەنى دەڕوات.

*ئەگەر پادشايەك بينى لەژێر چەترێكدا هاتە دەرەوە بەلگەيە لەسەر دەرچوونى لەدەستەلاّتى خۆى.

*ئەگەر بوو بەخاوەنى چەند چەترێك ياخود چوە ژێر سێبەرى بەلگەيە لەسەر نيعمەتێك كەپێيدەبەخشرىّ ئەگەر بتوانىّ سوپاسگوزارى بنوێنىّ.

*چەترى ناديارو ژێر چەرداخو گومەز ئەگەر رەنگى سەوز يان سپيبوو بەلگەيە لەسەر چاكەو گەواهيدانو

گەیشتن بەبەندایەتی یاخود بەلگەیە لەسەر سەردانی شاری (قودس).

**چەرمی دوای زین:** (نابلسی)دەلێت: بەلگەیە لەسەر بەرپرس و بژێوی پەیداکاری ، یان بەلگەیە لەسەر ماڵ و پشتوێن و قایش.

**چەسپکاری کەوش:** (نابلسی) دەلێت: لەخەودا پیاوێکی شارەزای ژیری کاروبار ئەستەم و گرانەو پیاوێکە نێوانی خەلکی چاکدەکات و تەبایی و خۆشەویستی دەخاتەوە لەنێویاندا.

*ئەگەر چەسپەکەی خراپبوو دەستگیر دەکرێ.

**چەقۆ:** ئەگەر خاوەنی چەقۆبێت لەخەوداو رەبەنبێ ژندەهێنێت، ئەگەر ژنەکەی دووگیانبوو نێرینەی دەبێت، وەگەرنا کچ دەبێت، بەهەمان شێوە رمیش هەروایە ، ئەگەر دووگیان نەبوو بەلام خوازیاری گەواهیدەرێکی حەقبێژبوو دەستیدەکەوێت، ئەگەر چەقۆکەی شاردەوەو پەنهان و شاراوە دەکرێ بۆی یاخود گەواهیدانەکەی بەرپەرچدەدرێتەوە، ئەگەر هیچکام لەوانە نەبوو سوودو قازانجە لەدنیا دەستیدەکەوێت یاخود پەیوەندییەکە بەهۆیەوە دەگات بەبراکەی یان هاورێیەکی یاخود خزمەتکارێکی یا بەندەیەکی بەپێی دان پێدانانی خەلکی.

*ئەگەر بەتەنیا چەقۆی پێدرا لەوکاتەدا چەقۆ دەستەلاتە هەروەها خەنجەریش بەلگەو بەهانەیە بەپێی ئایەتی: ﴿ وَآتَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ سِكِّينًا﴾ (یوسف : ٣١).

*ئەوەی چەقۆی سەر سفرە بەدەستی خۆیەوە ببینێ بەلام بەکارینەهێنێت کورێکی گوێرایەڵ و ژیری پێدەبەشخرێ، ئەگەر بینی بەکاری دەهێنێت بەلگەیە لەسەر بچرانی ئەوەی کەلەسەریەتی.

*قەڵەم دادەر بەلگەیە لەسەر کورێکی زیرەکی ئیرەییبەر.

*ئەگەر چەقۆیەکی بەدەستیەوە بینی دەگەرێتەوە بۆ لای ژنێك لێی جیابووبنەوە بەپێی ئایەتی: ﴿ قُلْ كُونُوا حِجَارَةً أَوْ حَدِيداً ، أَوْ خَلْقاً مِمَّا يَكْبُرُ فِي صُدُورِكُم فَسَيَقُولُونَ مَنْ يُعِيدُنَا قُلِ الَّذِي فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾ (الإسراء: ٥٠ ـ ٥١).

(نابلسی)دەلێت: لەخەودا بەلگەیە لەسەر خزمەتکاری ئەو شوێنە سوود بەخەڵکەکەی دەگەیەنێت و تیژی چەقۆکە بەلگەیە لەسەر بەجێگەیاندنی بریارەکانی یاخود جوولەی ئەوەی کەبەلگەیەلەسەری.

*ئەگەر ژنێك بینی چەقۆیەكی هەڵگرتوە یاخود چەقۆیەك دەدات بەژنێك بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی بۆ پیاوێكی ناسراوو بەناوبانگ.

*چەقۆی سەربڕین قەسابە.

*حەربەی سەرباز هێزوخزمەتگوزارییە.

*ئەگەر بینی چەقۆی پەروەرشیاری منداڵی دزی هۆگری یەكێك لەمنداڵەكانی دەبێت.

*چەقۆ بەڵگەونیشانەیە.

*ئەگەر چەقۆیەكی قوتدا لەماڵی كوڕی خۆیدەخوات.

*چەقۆ لەخەودا منداڵێكی نێرینەیە بۆیەكێك ژنەكەی دووگیان بێت.

*ئەگەر چەقۆی بەدەستییەوە بینی ئەو دووسەد درهەم بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر چەقۆی بەدەستهێناو لەداگاییدابێت سەردەكەوێتو بەڵگەونیشانەكانی جێگیردەبن.

*ئەگەر بینی چەقۆیەكی پێدراو جگە لەچەقۆ زیاتر هیچی دیكەی پێنەبوو كوڕو برای بۆ پەیدا دەبیَ، ئەگەر چاوەڕێی كوڕو برانەبوو خێرێكی زۆر بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر دەستی خۆی بڕی بەچەقۆ ئەوە رووداوێك دەبینیَ پێی سەرسامدەبێت.

*ئەگەر بینی چەقۆ یا خەنجەرێك دەكات بەكێلانو كیفەكەیدا ژنێك مارەدەبڕیَ.

**چەقۆتیژكەر:** (نابلسی)دەڵێت: ژنە یان پیاوێكە ژنو پیاو لەیەكدەكات یاخود جیاوازی دەخاتە نێوان دۆستو خۆشەویستانەوە.

**چەقۆساز:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: چەقۆساز پیاوێكە خەڵكی فێری وریای و ژیریو بێداریدەكات.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دڵنیاییو ویقار یاخود شەڕەنگێزیو خاوەن شەڕو ئاژاوە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ئەو بەرپرسەی كاروبارەكان لەسەر دەستی ئەو بەجێدێن.

**چەقەڵ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: چەقەڵ پیاوێكە مافداران بێبەشدەكات لەمافی خۆیان ، هەروەها وەك(ڕێوی) وایە لەخەودا ، بەلاَم (رێوی) بەهێزترە.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی (چەقەڵ) بەڵگەو نیشانەیە لەسەر یەكێك هۆی شەڕو ئاژاوەبێت یاخود نیشانەی خۆشەویستیو كۆبوونەوەیە بۆ یاریو گاڵتەبازیی.

**چەك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر چەكی بەخۆیەوە بینی لەنێو

پیاوانێکـــدابوو کـــەهیچ چـــەکێکیان هەڵنـــــەگرتبوو ســــــەرکردایەتی بەدەســـتدەهێنێت بەســـەر گـــەلو نەتەوەیەکدا، ئەگەر کۆمەڵو نەتەوەکە پیربوون ئەون ، ئەگەر لاوو جەحێلبوون دوژمنی ئەون.

*هەروەها دەڵێن: ئەگـەر خـاوەنی ئـەو خەونـە نەخۆشـبوو بەڵگەیـە لەسـەر مردنی.

(نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا هێـزو ســـەرکەوتنە بەســـەر دوژمنانـــداو دوورخـستنەوەی نەخۆشـییە ، ئەگـەر چەکی بەخۆیەوە بینیو توانـای هـەبوو بەکاری بهێنێ بەڵگەیە لەسەر تـەواویو گەیـــشتن بەپێداویـــستیەکانی ، دەگونجێت چاکیو باشی بێت لەئایندا، ئەگـــەر ترســـابوو یـــان نەخۆشـــبوو خوداوەنـــد چـــاکیدەکاتەوەو ئەگـــەر موسافیربوو بەسەلامەتی دەگەڕێتـەوە بۆلای خانەوادەکەی.

*ئەگـەر بینـی چـەکەکەی لێـسەندرا لاوازی دەســـــتەلاتو نەتـــــەوەو کەسەکانیەتی.

*پۆشـینی چـەکو جبەخانـە بەڵگەیـە لەسەر ئەو زانیارییـەی خـەڵکی نـەزانی پێ دووردەخرێتەوە.

*هەروەها بەڵگەیەلەسەر:

+ماڵوسامان لەهەژاری قوتاریدەکات.

+چەکو هێزە لەبۆ تۆقاندنی دوژمن.

+ســـەرکەوتن بەســـەر ئـــەوەی لێیدەترسیَ.

+چارەسەرێك نەخۆشی دەڕەوێنێتەوە.

+ئـەو هاوسـەرەی لەشـەیتان خـۆی پێدەپارێزێ.

**چەکفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: بینینـی چـەکفرۆش یـان چەکـساز لەخـەودا بەڵگەیە لەسەر دەستەلاتێکی ستەمکار وەك پۆلیس وایە.

**چـەکمەجە:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: مژدەیە دوای چەن رۆژێك دەگات ئەگەر گەوهـەرو دووروـمـەرجانی تێـدابوو ، هەروەها کـەنتۆری جلو بـەرگیش بـەو شێوازەیە.

(نابلـسی) دەڵێـت: بینینـی لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر کتێبـی جزروبەنـدکراو وتەو فەرمایشتی گەوهەری تێدایە.

*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر هاوســـەری دەوڵەمەنـــد یـــان پیـــاوی دەوڵەمەنـد بۆ ژنـی بێمێـرد، سـەرجەم چـــەکمەجەکانی تـــریش وەك هـــی کتێبخانەو عەتار بینینی بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجو بەجێهێنانی پێداویستی لەگـەڵ کۆکردنـەوەی خۆشەویـستان بەئەنـــدازەی خـــۆی، چـــەکمەجەی لاپەڕەش تەمەنێکی دووردرێژە.

**چەکوش:** (ئیبن سیرین)دەڵێت:
چەکوش پۆلیسە.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی چەکوشێکی هەڵگرت چاکەیەکی زۆر رووی تێدەکات.
*چەکوش بەڵگەیە لەسەر پشتگیری‌و رزق‌و رۆزی خاوەنەکانی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شەڕو هەڵە لەقسەو وتەدا.

**چەمانەوە( رکوع ) :** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی دەچەمێتەوەو نوێژدەکات بۆ پەروەردگار ئەوە ملکەچی خوداوەند دەبێت‌و دەستبەرداری خۆبەزلزانین دەبێت‌و سنووری خوایی جێبەجێدەکات‌و نوێژ ئەنجامدەدات‌و ئەوەی ئومێدیکردوە بۆی بەدەستدێت‌و زاڵدەبێ بەسەر دوژمنەکانیدا.
*ئەگەر بینی لەنوێژدا ناچەمێتەوە هەتا کاتی بەسەردەچێت زەکاتی ماڵەکەی دەرناکات، چەمانەوە لەخەودا خزمەتی کەسی بێکارە.
*دەگونجێت چەمانەوە بەڵگەبێت لەسەر تەمەندرێژی‌و خۆبەکەمزانین.
*ئەگەر ژنێك بینی بەتەواوی دەچەمێتەوە بەڵگەیە لەسەر تەوبەو بەرزکردنەوەی یادو زیکر بەخۆپارێزی.

**چەناگە :** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر گەورەی هۆزو تیرەو خاوەن رەچەڵەکێکی زۆر.
*ئەگەر بینی چەناگەی درێژبوە دەبێت بەکەسێکی قیڕەقیڕکارو قسەووتە دەکات لەبارەی باسێکەوە کەپەیوەندی پێوەنییەو لاوازدەبێت دوای هێزو توانا.
*چەناگە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤ خۆی پێجواندەکات لەماڵێکی دیارو بەرچاو یاخود باوکێك پشتگیرییکات یان کوڕێك یارمەتی بدات یاخود خزمەتکارێك خزمەتییکات، یاخود پلەوپایەیەکی بەرێزە بەهۆیەوە جێگیردەبێت.
*چەناگە بەڵگەیە لەسەر دەستنوێژگرتن ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بناغەی لانەو ماڵ.

**چەند سەرێك:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر سەرمایەو پارەگۆڕەرەوە.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر مەرگ یاخود کەوتنەنێو نارەحەتیەوە.
*ئەگەر چەن سەرێکی نادیاربوو قژو شاخ‌و خوێنی پێوەبوو بەڵگەیە لەسەر تیاچوونی زانایان.

*هەروەها(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر سەرێکی کرێی داوایەك لەسەرۆك و بەرپرسیدەكات یان داوای خزمەتگوزارییەكدەكات.

**چەو(بەرد)**: (ئیبن سیرین)دەڵێت:

چەوو وردە بەرد بەڵگەیە لەسەر:

+درهەمی سپی ژمێردراو.

+ژنی بچووك و باڵاكورت.

+پاراستن و ژماردن.

+حەج و بەردەبارانی شەیتان.

+توندوتیژیی و دڵڕەقی.

+دەرگاو تاوانباركردن.

*ئەگەر بینی مەلێك لەئاسمانەوە نیشێتەوەو زیخ و وردە بەردی هەڵگرت لەزەویی و ئەوجا فڕی، ئەگەر لەمزگەوتدابێت پیاوچاكێك دەمرێت ئەگەر خەوبینەر نەخۆش و خێرۆمەندبوو یاخود نوێژخوێن بێت و هیچكەس لەنوێژخوێنان نەخۆشی وایان نەگرتوو خاوەنی ئەو خەوە دەمرێت، ئەگەر باڵندەكە لەكەنیسەو دێرێك زیخی هەڵگرت وەك حاڵی ئەو نەخۆشە دەچوێنرێ كەلێی دواین ئەگەر بەردو زیخەكەی لەماڵێكدا یاخود لەشوێن و جێگەیەكی نادیار هەڵگرت نەخۆشێكی خەوبینەر لەكۆڕو ئەنداماني خاوەنەكەی تیادەچن، ئەگەر چنگێ زیخی هەڵگرت و خستییە تورەكەو جلێكەوەو پاشان قوتیدا ئەگەر لەمزگەوتدا قووتیدا یاخود لەماڵی زانایەك یاخود لەئەڵقەی زیكرو یادابوو سوود لەزانیاری و قورئانی پیرۆز وەردەگرێ یاخود سوودمەند دەبێت لەزیكری خوا بەئەندازەی ئەو بەردو زیخانەی هەڵیگرتوە.

*ئەگەر بەردەكەی لەبازاڕ یاخود كێڵگە هەڵگرت یان لەبنیدارو درەختدا سوودو قازانجە لەدنیادا سوودمەند دەبێت بەخێرو خێرات لەمسەراوسەری دەریاوبازرگانیدا.

*ئەوەی بەردو چەو هەڵبداتە نێو دەریا ماڵ و دارایی تیادەچێت لەدەریادا، ئەگەر هەڵیدایە نێو بیرێكەوە ماڵ و دارایی خەرجدەكات لەهاوسەرگیریدا یاخود بەكرێ گرتنی خزمەتكارێكدا، ئەگەر هەڵیدایە نێو بیرێكەوە ماڵ و دارایی خەرجدەكات لەهاوسەرگیریدا یاخود بەكرێگرتنی خزمەتكارێكدا، ئەگەر هەڵیدایە نێو مشەمای باران بۆ شەو یاخود دەفرێكی خواردنەوە یا لەگەنجینەیەكدا بەو ئەندازەیەی پێیەتی و هەڵیداوە ڕێنومایی دەكرێت بۆ جێیەك بازرگانی تێدا ئەنجامبدات، ئەگەر بەردوچەوی گرتە ئاژەڵێكی وەك

شێر یاخود مەیمون یان کوللەو قەلەڕەش‌و هاوچەشنەکانیان ئەگەر لەرۆژانی (حەج)دابوو شەیتان بەردەباراندەکات لەداهاتوودا چونکە بەردەبارانی شەیتان لەبنەڕەتەوە لەوەوە هاتوە (جوبرەئیل) (سەلامی خوای لێبێت) فەرمانی بە(ئادەم) کردوە کاتێ شەیتان خۆی نیشانداوە بەردەبارانی بکات ئەمەش بوە بەسونەتێك بۆ وەچەو نەوەکانی، خۆئەگەر وانەبوو واتە لەرۆژانی (حەج)دا نەبوو چەوەکان دوعایە لەدوژمن یان لەخراپەکار یاخود جنێوو قسەی ناشیرین یان گەواهیدانە دەیدات لەسەری.

*ئەگەر بۆ واژووی ئەمانە هەڵیاندا وەك کۆتر یان موسوڵمانان ئەو پیاوە دەم پیس‌و جنێوفرۆش‌و غەیبەتکارە قسە لەئابڕووی ژنی مێردار دەکات.

(نابلسی)دەڵێت: چەوو زیخ زانایانی خەڵکییە ، وتراویشە تەوبەو پەشیمانییە بۆ سەپێچیکارو رێنومایيە بۆ بێباوەڕان.

*دەگونجێت چەو بەڵگەبێت لەسەر شەهادەو گەواهی چونکە لەنێو دەستی پێغەمبەردا (ﷺ) یادو زیکری خودای کردووە.

*دەگونجێت بەردو زیخ بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی‌و دروستبوونی بەرد لەگورچیلەدا.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر لێدان بەبەرد.

*رۆیشتن بەنێو بەردا بەڵگەیە لەسەر شەڕو ناکۆکی‌و رکەبەرایەتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مردن چونکە لەسەر گۆڕ دادەنرێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بژێوی ئەوەی شتومەکی پێدەکێشن یاخود ئەوەی لێی دروستدەکرێت.

*بەرد قسەیەکی رەق‌و زبرە ، بەردێکی زۆریش سەرقاڵییەکی زۆرە.

*ئەگەر بینی بەرد لەگوێچکەیدایەو دەکەوێتە گوێ یان بەرد فرێدەدات قسەیەکی رەق‌و زبری گوێی لێدەبێت.

**چەوری( رۆن ):** (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی گۆشتی دەخورێ لەخەودا رزق‌و رۆزییەکی بەردەوامە لەگەڵ جل‌وبەرگێکی گرانبەها، چەوری ئەوەی گۆشتی ناخورێ بەڵگەیە لەسەر ماڵی حەرام‌و زیناو پاشگەزبوونەوە لەئاین یاخود گەڕانەوە لەوەی رێگری لێکراوە.

*ئەو چەورییەی چارەسەری پێدەکرێ بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر

چاكبوونەوە لەنەخۆشیو پێداویستیەك كەلەنەخۆشیدا سوودی لێوەردەگیرێ.

*دەگونجێت چەوری بەڵگەبێت لەسەر خۆشیو شاییو چاكبوونەوەی نەخۆش.

*چەوری ماڵێكی پوختەو بەماندوبوون بەدەستدێت.

**چ ی**

**چیا(شاخ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: چیاو شاخ دەستەلاتدارو پادشایەكی دڵڕەقی ستەمكارە، یان پیاوێكی لەشو لار گەورەیە بەپێی ئەندازەی چیاو مەزنیو بەرزیو نزمی بالای.

*هەروەها چیا بەڵگەیەلەسەر:

+پلەوپایەی بەرزو بلند.

+زاناو شارەزای لێبڕاوو خواناس.

+پلەوپایەی بەرزوبلند.

+شوێنو جێگەی پیرۆزو باش.

+مەبەستو خواست.

*ئەوەی خۆی ببینێ هەلدەزنێت بەسەر شاخێكدا یان پالی پێوەدابێتو لەژێر سێبەریدا دابنیشێ لەپیاوێكی سەركردەو گەورە نزیكدەبێتەوەو ناوبانگ دەردەكات، ئەوكەسە یا دەستەلاتدار یاخود خواناسو ئایندارە.

*ئەگەر خۆی بینی بانگدەدات لەبەرچیاكەو روویكردوەتە قیبلەو تیرورم بەدەستی خۆی هەلدەدات ناوبانگ لەنێوخەلكیدا دەردەكات بەئەندازەی رۆیشتنی دەنگی، نووسراوو فەرمانەكانیشی بەئەندازەی گەیشتنی تیرو رمەكانی دەبێت.

*ئەگەر خۆی بینیەوە بەسەریەوەو لەكاتی بێداریدا دەترسا دڵنیادەبێت.

*ئەگەر لەنێو كەشتیەكدابوو شەپۆلەكان داباربن بەسەریاو هەلزنا بەچیاو شاخێكدا قەلغانو پارێزگارییە بەپێی ئایەتی:﴿سَآوِي اِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ المَاءِ﴾(هود:٤٣).

(ئیبن سیرین)دەڵێت: لەوكاتەدا چیا قەلغانو پارێزگارییە، بەلام ئەگەر لەسەر كەشتیەكە هەلهاتو روویكردە چیایەك تیادەچێت بەپێی چیرۆكی كوڕەكەی(نوح)- سەلامی خوایلێبێت -.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەرئەوەی یەكێك لەكاتی بێداریدا لەنێو كەشتیو دەریادا نەبێتو لەكۆمەڵو تاقم جیابووبێتەوەو دوای هەواو ئارەزووی خۆی كەوتبێت.

*سەركەوتن بەسەر چیادا خوازوداوایە خەوبینەر دووی دەكەوێت.

*ئەگەر سەركەوتن بەسەرچیادا رێگەكەی سووكو ئاسانبوو بۆ گەیشتن بەویستو ئاواتەكانی بەوچەشنە دەبێت.

*ئەگەر کۆسپو گرفت رووی تێکرد لەسەرکەوتنی بەسەر شاخدا یان پێپلیکانەو هۆکاری ئاسانکاری سەرکەوت ترس‌وبیم رووی تێدەکات‌و سەرجەم کاروبارەکانی مەترسیدار دەبێت، خۆئەگەر گەیشت بەبەرزاییەکەی لەو ئافەو بەلایە قوتاردەبێت.
*ئەگەر بەئاگاهات لەخەو بەرلەوەی بگات یاخود لەخەوەکەیدا کەوتەخوارەوە لەرێی گەیشتن بەهیواو خوازەکەیدا تیادەچێت یاخود ئاینەکەی تیادەچێت لەوپێناوەدا بەئەندازەی مەترسیی‌و زیان بەشۆڕبوونەوەو کەوتنی یان شکانی ئەندامەکانی دیاریدەکرێت.
*کەوتنەخوارەوەش لەچیاو سەربان‌و دیواری بەرزو سەردارخورماوە بەڵگەیە لەسەر جیابوونەوە لەفەرمانڕەواو هاوسەرو موڵك‌و کارو حاڵ‌وبار، کاتێ خەوی بۆ لێکدەدرێتەوە پرسیاری لێدەکرێت سەبارەت بەگرنگترین ئومێد یان حاڵ‌وبارێك لێی بترسێت ئەوجا پاش‌وپێش دەخرێت بۆی لەجیابونەوەو بەردەوامبوون لەسەری، ئەگەر بەهۆی سەرقاڵییەوە تووشی شپرزەیی‌و تێکەڵ‌و پێکەڵی هاتبوو بڕیار لەسەر ئەوەدەدرێت کەلێی کەوتوەتەخوارەوە لەخەوەکەیدا بەپێی بەڵگەکەی.
*بەڵگەیەلەسەر جیابوونەوە لەسەر ئەو کاروبارانەی بەپێی بەڵگەکانی ، هەروەها ئەو شوێنە رەچاودەکرێت کەلێی کەوتوە لەزەوی وشك‌و تەڕ یان بەردەلان‌و لم‌و دەریا...
*دەگونجێت ئەوکەوتنە بەڵگەبێت لەسەر کەوتنە نێو گوناهو فیتنەو رەفتاری خراپەوە ئەگەر کەوتە نێو کونەمار یان شوێنی پیس‌و کەندەلان.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەستبەرداربوون لەگوناهو تاوان‌و بیدعە، ئەگەر هەڵهات لەوە یان کەوتە نێو مزگەوت یان باخچەیەك یان بۆ لای پێغەمبەرێك یان قورئانێکی هەڵگرت یاخود بەخێرایی چوو روو بەنوێژی بەکۆمەڵ.
*ئەگەربینی لەسەر چیایەك کەوتەخوارەوە یان چایەك رووخا یان سووتا بەڵگەیە لەسەر تیاچوونی ئەوەی چیاکە بەڵگەیەلەسەری مەگەر بەرزبێتەوەو ئەو بەلاو ئافانە نەیگرێتەوە ئەوەش ترس‌و بیمێکی بێپایانە روودەکاتە خەڵکی لەلایەن دەستەلاتدارەوە ، لەبەرئەوەی بەنی (ئیسرائیل)یەکان چیاکەیان بەسەردا

بەرزبوەوە وەك سێبەرێك هەتا بترسن لەخواو نەكەونە گوناهو تاوانەوە.

*رۆیشتنی چیاو شاخ بەڵگەیە لەسەر بەرێوەبردنی رووداوێك ، ئەو رووداوەش دەگونجێت جەنگێكبێت هەندێك لەپادشاو دەستەلاَتداران تاوی بدەن یان جیاوازییە كەوتوەتە نێوان هەندێك لەزانایانی سەر زەوی فیتنەو نارەحەتی بەرپادەكاتو سەرجەم خەڵكی دەكەونە نارەحەتیو داماوییەوە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر مردنو تاعون ، چونكە لەنیشانەكانی قیامەتە.

*ئەگەر چیاكەبوو بەكەفو تەپو تۆزو خۆڵەمێش ئەوكەسەی چیاكە بەڵگەیە لەسەری هیچ خێرێكی تێدا نییە نەلە دنیاو نەلە ئایندا.

*چیا بەڵگەیە لەسەر شكۆمەندبوون دوای سەرشۆڕیو دڵنیابوون و دوای بێباوەڕی خوداناسیو پاش زۆرداریی دەگەڕێتەوە سەر بارو حاڵی یەكەمی، چونكە خوداوەند وەك دەفەرموێت چیاكانی لەكەفی سەرئاو دروستكردوەو كەفیش بەتاڵو بێبەهایە هەروەك خوداوەند ئاماژەی پێكردووە.

*ئەو چیایەی ئاوو رووەكو سەوزایی تێدایە پادشایەكی خاوەن ئاینە، ئەگەر هیچ سەوزاییو ئاوێكی تێدا نەبوو پادشاو دەستەلاَتدارێكی بێباوەڕە ، چونكە وەك مردوو وایە یادی خودا ناكاتو بەپیرۆز رایناگرێ.

*چیای راگیرو چەسپاو زیندو باشترە لە چیای رماوو كەوتوو، ئەوچیایەی دەكەوێتو دەبێت بەبەرد مردووە، چونكە یادو زیكری خودا ناكات.

*ئەگەر سەركەوت بەسەر چیاداو لەئاوەكەی خواردەوەو شایستەی فەرمانڕەواییبوو لەلایەن پادشاو دەستەلاَتدارێكی دڵڕەقی سوودبەخشەوە بەدەستی دەهێنێت لەگەڵ ماڵو دارایی بەئەندازەی ئاوخواردنەوەی، ئەگەر بازرگانبوو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوەو سوودبەخشدەبێت، سووكیو سانایی بەرزبوونەوەشی بەدەستهێنانی پلەوپایەیە بەپێی قورسیوگرانی، كۆسپو رێگریش نارەحەتیو سزایە، ئەگەر لەسەر چیاكە هاتەخوارەوە قوتاردەبێت، ئەگەر بەسەر گریو كۆسپدا سەركەوت پلەوپایە بەدەستدەهێنێت بەچەشنی ماندوێتیو نارەحەتی.

*ئەوبەردانەی دەوروبەی چیاودارەكان نارەحەتیو كۆسپەكانی ئەو شوێنو جێگایەیە، هەموو بەرزبوونەوەیەك

بەرزییەو دابەزینیش نزمیو سووکییە، هەموو سەرهەڵدانێك بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە، دابەزینی دەروو لێکردنەوەیە، هەموو بەرزبوونەوەیەك بەڵگەیە لەسەر دەستەلاتو دابەزینیشی لابردنە.

*ئەگەررببینی چیایەکی هەڵگرتووەو قورسو گرانە لەسەری ئەرکی پیاوێکی گەورە یان بازرگانێك گرانو قورسدەبێت لەسەری، ئەگەر سووكو ئاسانبوو لەسەری سووكو ئاساندەبێت بۆی.

*ئەگەر وایبینی چووەتە نێو ئەشکەوتێك لەچیایەکدا ڕێنموونی لەئاینو کاروبارەکانیدا بەدەست دەهێنێتو کاروباری دەستەلاتدار دەگرێتە دەستو زاڵدەبێت بەسەریا.

*ئەگەرچوە نێو ئەشکەوتێك نەخشەو پلان لەدژی پادشاو فەرمانڕەواو پیاوێکی پارێزراو دادەڕێژێت ، ئەگەر چیایەك رووبەروویبوو غەمو پەژارە یان سەفەر یاخود ژنێکی رەقو ئەستەمە.

*ئەگەر هەڵزنا بەچیایەکدا مەبەستو مەرامەکەیەتی بەئەندازەی پیاهەڵزنانی پێدا لەگەڵ جێگیربوونی.

*ئەگەر وایبینی لەشوێنی بەرز دەخوات نائومێد دەبێت لەوەی جێگەی ئومێدو هیوای بوە ، ئەگەر لەگەڵ ناندا خواردی چاودێریدەکرێتو بەهۆی بژێوییەوە ناخۆشیو تەنگو چەڵمە قبوڵدەکات.

*ئەگەرببینی خەڵکی بەبەرد لادەبات کاری نەتەوەکەی (لوط)ئەنجامدەدات.

*هەموو بەرزبوونەوەیەکی مرۆڤ یان کۆسپو گرفتێكو هەرشتێکیتر بەدەستهێنانی ئەوەیە خوازیاریەتی.

*سەرکەوتن بەڕێکی نارەحەتییەو هیچ خێرێکی تێدا نییە.

*ئەگەرببینی لەتەپۆڵکەیەك دابەزییە خوارەوە یاخود لەکۆشکێك یان چیایەك ئەو داواوخوازەی دوویکەوتوە کەمو کەلدەبێتو بەجێنایەت.

*ئەوەی ببینێ شاخو چیایەك دەڕمێنێ پیاوێك تیادەبات.

*ئەگەرببینی مەبەستیەتی سەربکەوێت بەچیایەکدا مەبەستو هیوایەکی هەیەو دوویکەوتووە، ئەگەر خۆی بەسەریا زاڵبوو ئومێدو هیواکەی بەدەستدەهێنێت ، ئەگەر کەوتە خوارەوە نامۆو غەریب دەکەوێت.

(نابلسی)دەڵێت: چیا لەخەودا پیاوێکی پلەوپایە بەرزو دڵڕەقەو دەنگێکی

بڵندی هەیەو، کاروباری خۆی ڕێکدەخاتو جێگیرە لەسەری، یاخود پیاوێکی سەرکردە یان منداڵێکی نێرینەو بازرگانە، یان ژنێکی دڵڕەقە یان غەمو پەژارەیە یاخود سەفەرو پەیمانە.

*ئەگەر ئەو چیایەی لەسەری جێگیربوو ئاوی تێدابوو فەرمانڕەوایەکی دیندارە، ئەگەر چیاکە ڕووەکو ئاوی تێدانەبوو فەرمانڕەوایەکی بێباوەڕی یاخییە چونکە وەك مردوو وایەو یادی خودا ناکاتو هیچ سوودێکی نییە بۆ خەڵکی.

*چیای جێگیرو چەسپاو زیندوە، باشترە لەچیای کەوتوو، ئەو چیایەشی دەڕمێتو دەبێت بەبەرد مردووە.

*ئەگەربینی سەرکەوت بەسەر شاخێکدا جێگیربێت لەسەر چیایەکدا ئاوەکەی بخواتو شایستەی دەسەڵات بێت بەدەستیدەهێنێت، یان دەستەڵاتێك بەدەستدەهێنێت لەلایەن پادشایەکی گەورەو دڵڕەقو سوودمەندەوە.

*ئەگەر ڕووەکی بینی هیواو ئاواتی بەدەستدەهێنێتو ملکەچی فەرمانڕەواو پادشایانی ستەمکار دەبێت، ئەگەر بازرگانبوو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوە.

*ئاسانیو سووکی بەرزبوونەوەی ئەو دەستەڵاتە بەبێماندوبوون بەدەستدەهێنێت، قورسیو گرانی سەرکەوتنیشی ماندوبوونیەتی لەکاروباری ئەو شوێنەدا.

*ئەگەربینی سوپاسگوزاری خوداوەندە دەبێت بەدەستەڵاتدارێکی دادپەروەر، ئەگەر ستەمیکرد دەگونجێت، خۆئەگەر کڕنووشی برد بۆ خودا لەوێ یان بانگیدا دەستەڵاتو پۆستێك وەردەگرێتو زاڵدەبێت بەسەر دژومنەکانیدا ، ئەگەر لەسەر ئەو چیایەوە دابەزی لەپۆستو دەستەڵاتی لادەبرێت، ئەگەر فەرمانڕەوابوو لەکاردەخرێتو گەر بازرگانیشبوو زەرەرمەندو پەشیماندەبێتەوە.

*ئەگەر بەسەر چیایەکی بێ ڕووەکدا سەرکەوت دەچێتە ژێرکاری پادشایەکی بێباوەڕو غەمو پەژارە ڕووی تێدەکاتو سزایەکی توند دێت بەسەریا، ئەگەر هاتەخوارەوە قووتاردەبێت، ئەگەر پیایدا سەرکەوت دەستەڵاتێك بەدەستدەهێنێت بەماندوبوونو هیلاکی، ئەو بەردودارانەشی لەدەوری چیاکەدایە سووکیو نزمی فەرمانڕەوایە.

*ئەگەر بەردی لەدەوروبەری بینی سەرۆکایەتی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگـەربینی لەچـیایەك دەكەوێتـە خـوارەوە گونـاهو تاوانێـك ئەنجامدەداتو زەرەرو زیان روودەكاتە لەشولاری یان مرۆڤ دەكەوێتە نێو ئەو هەڵەیەوە كەبەئەنـدازەی ئەوەنـدەی تێی كەوتوەو پلەوپایەی دەگۆڕێت.

*ئەگـەر قاچی شكا لەبەرچاوی ئەو فەرمانڕەوایـە دەكـەوێتو زەرەر روو لەماڵەكەیدەكات.

*ئەگـەر بەسـەر چیایەكدا سەركەوتو دانەبـەزی لەناوەڕاسـتی تەمەنـەدا دەمرێت.

*ئەگـەر سـەركەوت پێـداو دانیـشت لەسـەری كـوڕێكی گـەورەی دەبێـت ، هـەموو بەرزبوونەوەیـەك بـەرزی پلەوپایەیـەو هـەموو دابـەزینێكیش نزمییـە، ئەگە بەرزبوونـەوە بەڵگـەبێت لەسـەر غەموپـەژارە دابـەزین بەڵگەیـە لەسەر دەروولێكردنەوە.

*هەموو بەرزبوونەوەیەك بەڵگەیەلەسەر فـەرمانڕەوایی، دابـەزینیش بەڵگەیەلەسەر شكۆمەندیی.

*ئەگـەر وابیینـی چیاكە سـووتا یـان كەوتـەخوارەوە پیـاوێكی مـەزنی مەترسیدار دەمرێت یان دەستەڵاتدارێك زاڵـدەبێت بەسـەریا چـونكە ئـاگر فەرمانڕەواییە.

*ئەگـەر چیاكە هاتـە لـەرزە پاشـان جێگیربـوو دەسـتەڵاتداری ئـەو زەوی‌و خاكە بـەلاو نەهامـەتی رووی تێـدەكات ئنجـا كاروبـاری چـاكدەبێت لەگـەڵ كاروباری دەوڵەتەكەی.

*ئەگـەر زاڵبـوو بەسـەر چـیاكەداو خستییە ژێر دەسـتەڵاتییەوە زاڵـدەبێت بەسـەر پیـاوێكی مـەزنی مەترسیداردا، ئەگـەر پـاڵی پێـوەدا پاڵـدەدات بـە پادشـایەكی مەترسـیداردا، ئەگـەر لەژێرسـێبەری دانیـشت لـەئامێزو ژێـر دەستەڵاتیدا دەژی.

*ئەگـەر چیایەكی بینـی لەئاسمانـەوە دابـەزی روودەكاتـە فـەرمانڕەوای ئەوشـارە، ئەگـەر روو بـەئاسمان بەرزبوەوە لەكاردەخرێت.

*ئەگەر لەشاخێكەوە فرێدرایەخوارەوە قـسەدەكرێت بەرانبـەری ، ئەگـەر جلوبـەرگی جـوانو قەشـەنگی بەخۆیـەوە دی دەسـتەڵاتی بـەهێزو هێمنـە بەئەنـدازەی ئـەوەی دەیبینـی‌و لێیدوور دەكەوێتەوە.

*هەموو بەرزبوونەوەیەك مـرۆڤ بیبینـی بەسەر چیایەكدا یان كۆسپێكدا یاخود تەپۆڵكـەو بەرزییـەك بەدەسـتهێنانی ئەوەیـە كـەخوازیارو داواكـاریبوە،

هەروەها دەڵێن: سەرکەوتنی هاوسەنگ ناڕەحەتیو دەردەسەرییە.

*ئەگەر چیایەکی لەشوێنو جێگەیەکی دوورەوە بەدیکرد سەفەر دەکات یان غەمو پەژارە رووی تێدەکات.

*هەروەها دەڵێن: چیا پەیمانە، ئەگەر چەسپاوو جێگیربوو لەسەری مردنیەتی.

*ئەگەربینی لەقەدوپاڵی چیایەکدایە ماوەیەك دەمێنێتەوە.

*ئەگەر وابینی چیایەك دەجووڵێت فەرمانڕەواو دەستەلاتداری ئەو ولاتە سەفەردەکات.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەربینی سەردەکەوێت بەسەر چیایەکدا پلەوپایەو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەرچیایەکی بینی خێروبەرەکەت رووی تێدەکات.

*ئەگەربینی چیایەك تووشی لەرزە دێت بەلاو نەهامەتیەکی گەورە روو لەو شوێنەدەکات ، پاشان پەروەردگار خەڵکەکەی هێمنو ئاسایشدەکات.

*ئەگەر دارودرەختی بەسەر چیاوە بینی پلەوپایەو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت لەنێو خەڵکیدا.

*ئەگەربینی سەرۆکەکان لەسەر بەرزاییو تروپکی چیاکان کۆبوونەتەوە لەوشارە یان گەڕەکێکدا دەمرن یاخود غەمو پەژارە روویان تێدەکات لەلایەکەوە داواوخوازیاری خراپەبوون لەپەروەردگار.

*چیاو تەپۆڵکە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەیەکی گەورەوگران لەگەڵ ترس‌وبیمو بشێویو بێکاری، بۆیەکێکیش کارێکی خراپو ناڕەوا ئەنجامدەدات بەڵگەیە لەسەر زەرەرو زیانو بۆ دەوڵەمەندیش زیانە.

*ئەگەربینی بەسەر کۆسپێکی قورس‌و هەڵتۆقیودا سەردەکەوێت رووبە ناوچەیەکی بەرینو فراوان گەردنی کەسانیتر ئازاد دەکات یان چاکە لەگەڵ هەتیودا دەکات یان چاکەیە لەگەڵ نەخۆشدا.

*ئەگەربینی دەچێتە نێو ئەشکەوتێك هێمنیو پشتبەستن بەخوداو دڵئارامی بەدەستدەهێنێت.

*دەگونجێت چیا بەڵگەبێت لەسەر:

+بەندەر کەوا کەشتی لەنگەری تێدادەگرێت.

+ئەوەی مرۆڤ رووی تێدەکاتو دەچێتە ژێرسێبەری وەك گەورەو کوڕو...

+خێروچاکەو خراپەی مرۆڤ بەهۆی ئاوودارو درەختو میوەی چیاوە.
+بەرزیو بڵندی مرۆڤ بێخێری.
+بەڵێن.
+ترسوبیم.
+بۆ موسافیرو گەشتیار بەڵگەیە لەسەر نغرۆ بوون لەدەریادا.
*ئەگەر چیایەکی بینی مەزنو بالآبوو وەك سێبەرێك بەڵگەیە لەسەر رووداني سزا.
*ئەگەر سەرکەوت بەسەر چیایەکداو ئاوی سازگارو میوەو شتی تری لێبێنی بەهۆی هاوسەرێکی خێردارەوە پارێزراو دەبێت، یاخود زانیارییەك فێردەبێت بەهۆیەوە لەنەزانین پارێزراو دەبێت ، یان پیشەیەك فێر دەبێت دەرووی لێوە دەکرێتەوە یان پلەوپایەیەك بەدەستدەهێنێت، یاخود سەفەرێکی بەسوود دەکات یا سوودو قازاج بەفەرمانڕەوایەك دەگەیەنێت، یان بەڵێنێکی پێدەدرێت دەرەنجامەکەی باشدەبێت.
*ئەگەر لەرێگەیەکی گونجاوو جێگیرەوە روو بەچیایەك چوو لەلای خۆیەوە دەستدەداتە شتەکان.
*ئەگەر چیایەکی پیرۆزبوو وەك چیای عەرەفات یان چیای (قاف) یا چیای (جودی)و (ئوحود) یان چیای (لوبنان) یاخود چیای(قاسیون) یا چیای (طور)و هاوچەشنەکانی، لەخزمەتی زانا بەرێزو چاکەکاندا دەبێت ، یان دەگونجێت روو لەناوچەیەك بکاتو مەبەستو مەرامی خۆی بەدەست بهێنێت.
*ئەگەر چیایەکی بینی کوترا دەمرێت یاخود لادەبرێت ئەگەر چیا بەڵگەبێت لەسەری.
*دەگونجێت خەوبینەر ملکەچیو خواناسی پێئەنجام بدات.
*چیاش بەڵگەیە لەسەر پادشاو بەرپرسو پیاوچاکو زانایان.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خاوەنی ئاینو دنیا.
*ئەگەر بیرێکی هەڵکەند لەچیایەکدا، یاخود بەردی لێگوێزایەوە بۆ شوێنێکیتر بەربەرەکانی لەگەڵ مرۆڤێکی دڵڕەقدا دەکاتو هەوڵیکارو کردەوەیەکی گونجاوو لەبار دەدات گەرچی نارەحەتیو ماندوبوونی تێدایە.
*ئەگەر چیاکەی بینی لەگەڵدەڕوات بەڵگەیەلەسەر رووداني جەنگو بشێوی تێداو هەندێك لەپادشاو میرەکان دەکەونە جموجووڵ یان جیاوازی دەکەوێتە نێوانیان، یاخود بشێویو

پێکـدادان دەکەوێتـە نێـوان زانایـانی سەرزەوی‌و فیتنەو ئاشووب دەکەوێتـە هـەموو لایـەك‌و بـارێکی ئـالۆزو خـراپ بەرپادەبێت.

*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر دادپەروەری لەوشوێنەدا.

*ئەگـــــەربینی بەسەرچـــــیایەکەوە وەسـتاوە پـشتدەبەستێت بـەپیاوێکی گەورەو لەسەردەستی ئەودا خێرو ڕێزو پلەوپایە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگـەربینی خـۆی پێـوە هەڵواسـیوە پابەنـدو وابەسـتەی پیـاوێکی لـەو شێوەیە دەبێت.

*ئەگەربینی خۆی لەسـەر چیایەکەوە هەڵدەداتە خـوارەوە کتێـب‌و قسەکانی لای فـــەرمانڕەوا پەســـەندو گونجـــاو دەبێت.

*ئەگەر خۆی لەسـەر چیایەك بینیـەوە یـــاخود بەســـەر چـــیایەکدا هـــەڵزناو شمشێرێك بەدەستیەوەبوو یا قـەڵغانێك یـا لـەوێ جل‌وبـەرگێك بپۆشـێت یـان خاوەن دەستەڵات لەگەڵیدابێت لەسـەر چـیاکە دەســتەڵات‌و فـــەرمانڕەوایی‌و بەدەســـتدەهێنێت یـــاخود خێـــرو پلەوپایەی بەرزە.

*ئەگەربینی دەیـەوێت بەسەرچیایەکدا سـەربکەوێت دەیـەوێت کاسەلێسی بۆ پیاوێکی دڵڕەق بکات کەهیچ هیمەتێکی نییـە یـان دەیـەوێت کـارێ بەئـەنجام بگەیەنێت ئەوجا چیا ویست‌و خوازێکە لەنەفـسیدا پێـی دەگـات بەئەنـدازەی سـەرکەوتنی پێـدا هـەتا لەسـەری جێگیردەبێـت یـان بـەپێی کۆسـپ‌و ناڕەحەتیـەکانی‌و ئاسـانی، ئەگـەر جێگیربـوو لەسـەری مەبەسـت‌و هیـواو ئومێـدی بەدەسـتدەهێنێت یـان ئـەو ئومێدەی هەیەتی.

*ئەگەر چیایەکی بینـی بـەنێو زەویدا ڕۆدەچێت دەستەڵاتدارو فـەرمانڕەوای ئەو زەوییە دەمرێت.



**چێرگ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پیـاوێکی دەســـت‌و دڵفراوانـــی دەوڵەمەنـــدو خۆشگوزەرانە.

**چـێژ (رابـواردن):** (نابلـسی)دەڵێـت: لەخـەودا سـوودو قازانجـە بـۆ کەسـێك وەریبگرێ.

*هەروەها بەڵگەیە لەسـەر ئەوکارانـەی سزاو خەشمی خـوایی دەهێـنن لـەزیناو ســوود یـــان فرۆشـــتنێکی حـــەرام خوداوەنـد دەفـەرموێ: ﴿قُلْ تَمَتَّعُوا فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى النَّارِ﴾(ابراهيم: ٣٠).

*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر لـــەخۆبایبوون بـــەماڵ‌و خـــودی خـــۆ ،

دەگونجێت بنەڕەتی ئەوەش لەشەریکایەتیەوە هاتبێت چونکە ژن سوود وەردەگرێ لەوەی وەریدەگرێ ، پیاویش چێژ دەبینێ.

**چێژتن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: چێژتن لێکدانەوەی جیایە بەپێی حاڵوبارەکان، ئەگەر بینی شتێکی چێژتو تامو چێی لێوەرگرت دەرووی خێرو نیعمەت بەدەستدەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿ وَاِنَّا اذا اَذَقْنَا الإِنْسَانَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا ﴾ (الشورى: ٤٨).

*ئەگەر بینی چێژی شتێکیکردو تامێکی تاڵیهەبوو داواکاری شتێکە زیانی لێوەی پێدەگات.

*ئەگەر بینی چێژی شتێکیکردو رقی لێنەبووەوە، بەباشیشی نەزانی بەڵگەیە لەسەر هەژاریو ترسو بیمی.

**چێشت:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەدەستهێنانی خوازوو ویستە ئەگەر بەتەواوی لێبنرێ.

*ئەگەر بینی بەئاگر چێشتی لێناو پێگەیشت ویستو خوازی بەدەستدەهێنێو دەکەوێتەسەر زوبانی خەڵکی، ئەگەر پێینەگەیشت ویستو خوازی بەدەستناهێنێت.

*چێشتو ڕژاندنی کارێکە سوودی لێوەردەگرێ ئەگەر چێشتەکە پێگەیی رزقو رۆزییە، ئەگەر چێشتێکی بۆگەنی لێنا بڕیارە.

*هەموو خواردنو چێشتێکیتر رزقو رۆزییە جگە لەهەریسە.

*ئەگەر چێشتەکەی گۆشتی مەڕی تیابوو ژیانێکی باشو شکۆمەندە لەلایەکی حەڵاڵەوە رووی تێدەکات، ئەگەر بەگۆشتی مانگابوو ژنێکی خۆشنودە لەلایەن کرێگرتە بەسوودەکانەوەیە، ئەگەر بەگۆشتی درندەوە لێی نابوو دەستەڵاتە بەسەر کۆمەڵێکی ستەمکاردا لەگەڵیشیا ترسو بیمو زۆرلێکردنی تێدایە ، ئەگەر چێشتی بەگۆشتی سەگ لێنابوو دەستەڵاتو فەرمانڕەوایەکی گەندەڵو پیسە، خۆئەگەر چەوری لەگەڵدابوو ماڵێکی حەرامی بەدەستهێناوە، ئەگەر چەوری لەگەڵدانەبوو بژێویو کارێکی سووکو گەندەڵە بەهەژاریو بێبەشی بەدەستیدەهێنێت ، ئەگەر بەگۆشتی باڵندەبوو دەستەڵات یان بازرگانی یاخود کاسبیەکی حەڵاڵە لەگەڵ کۆمەڵێك دەوڵەمەندی رێزداردا، ئەگەر بەگۆشتی باڵندەی درندە لێنا بازرگانییە یان دەستەڵاتە لەلایەن گەلو کۆمەڵێکی چاوبەستکارەوە کەماڵو داراییان حەرامە.

**چێشتلێنەری بۆنەکان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: چێشتلێنەرو هەرکەسێك کاروپیشەی بەئاگر بڕوات بەڕێوە قسەکارو خاوەن بەربەرەکانیو گوناهە وەك خزمەتگوزارانی دەستەڵاتو کاسەلێسانی یاخود دەلاڵەکانی بازاڕ.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی چێشتلێنەر لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شاییو خۆشی، بینینی چێشتلێنەری بازاڕ بەڵگەیە لەسەر:

+پەرچدەری سوود.

*بینینی ئامادەکاری قەندوشەکر بەڵگەیە لەسەر:

+زانیاری.

+دانایی.

+رزقو رۆزیی.

*بینینی چێشتلێنەری پیاو ماقوڵان بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە.

*بینینی ئامادەکاری قیر بەڵگەیە لەسەر: بازاڕساردیو سەفەرکردن بەدەریادا.

*بینینی ئامادەکاری نیشاستە بەڵگەیە لەسەر کۆکردنەوەی ماڵو سامانی حەرامو خەرجکردنی لەهەمان رێگەدا.

*بینینی چێشتلێنەری سەفەر بەڵگەیە لەسەر غەریبیو گواستنەوەی لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر یان لەحاڵوبارێکەوە بۆ حاڵو بارێکیتر.

*چێشتلێنەر بەڵگەی خێرە بۆ یەکێك بیەوێت هاوسەرگیری ئەنجامبداتو چێشتلێنان بۆ نەخۆش باش نییە چونکە ئامادەبوونە بۆ تیاچوونو سەفەرکردن.

*چێشتلێنان لەماڵی خۆدا بەڵگەی خێرە بۆ یەکێك بیەوێت هاوسەربگرێ.



# حی

## ح ا

**حاجی لەق لەق:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر کۆمەڵێك حەزو ئارەزوو.

*ئەگەر مرۆڤ بینی لەزستاندا ئەوە بەڵگەیە لەسەر درزو جەردەو دوژمنی جەنگاوەر.

*ئەگەر بینی کۆمەڵێ حاجی لەق لەق بڵاوبونەتەوە بەڵگەی خێرە بۆ یەکێك لەسەر سەفەربێت ، هەروەها بەڵگەیە لەسەرئەوەی سەفەرکار دەگەڕێتەوە لەسەفەرەکەیو بەڵگەی خێرە بۆیەکێك بیەوێت هاوسەربگرێت.

## ح و

**حوشتر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر حوشترێك بەبێکەڵوپەل چوە نێو شارێك یاخود بەڕێگەیەکدا ڕۆیی ڕێگەی ئاژەڵنەبوو هەورو بارانە.

*ئەگەر بوو بەخاوەنی حوشتر شکست بەسەر پیاوانێکدا دەهێنێت کەرێزو ئاشتی تایبەتیان هەیە.

*یەك حوشتر پیاوێکە ئەگەر حوشترێکی نەجیبو رەسەنبوو سەفەر دەکات یاخود شێخو ناودارێکی بەڕێزە.

*دەگونجێت حوشتر بەڵگەبێت لەسەر شەیتان بەپێی وتەی: "لەسەر ملەکەی شەیتان هەیە".

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مردن بەهۆی چوونەسەرو شێوەی دروستکردنی هەروەها چونکە خۆشەویستان بۆ شوێنی دوور دەگوێزێتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پیاوی نەزانو دووڕوو بەپێی ئایەتی: ﴿إِنْ هُمْ إِلاَّ كَالأَنْعَامِ﴾(الفرقان: ٤٤).

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی بەئارامو بارگران.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کەشتی لەبەرئەوەی حوشتر کەشتی وشکانییە.

*بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر(ﷺ)

کەدەفەرموێت: "سواربوونی حوشتر غەمو پەژارەو ناوبانگە".

*نەخۆش ئەگەر وای بینی سواری حوشترێکبوەو سەفەر دەکات دەمرێت، ئەو حوشترە دارەمەیتو تەرمەکەیەتی.

*ئەگەر سواری حوشترێکبوو لەشاساغبوو سەفەردەکات، مەگەر لەناوەڕاستی شارێکدا سواری ببێت یاخود بینیێ نەڕوات پێوەی ئەوجا غەمو پەژارە رووی تێدەکاتو نایەڵێت هەڵبێت لەسەرزەویو وەك زیندانیکردنو نەخۆشی وادەبێت بۆی بەهۆی دووری زەوییەوە.

*ئەگەر یاخیبوویەك لەدەستەلاتو فەرمانڕەوا بینی تیادەچێت ئەگەر جلوبەرگی ناسراوی خۆی پۆشیبو مەگەر بەسەیارەو سواری بێت ئەوجا دەگونجێت پەنابگرێت بەپیاوێکی گەورەو بەلەشولار.

*ئەگەر ژنێکی بێهاوسەر سواریبوو شوودەکات ، ئەگەر هاوسەرەکەی لەسەفەردابوودەگەڕێتەوە بۆلای مەگەر لەخەوەکەیدا هێمایەکی تێدابێت لەسەر شەڕو خراپە کەناوبانگ دەردەکات پێی.

*ئەگەر حوشترێکی بینی دەچێتە نێوگەرووی یان دەفڕێ ئەوەجنۆکەیە دەستی لێدەوەشێنێ یان دەست لەخانەوادەو خزمەتکاری دەوەشێنێ.

*ئەگەر حوشترێکی سەربڕاوی بینی لەماڵێکدا بەخێوکەری ئەو خانەوادەیە دەمرێت ئەگەر نەخۆش بێت یان منداڵو بەردەستو گەورەی دەمرێت بەتایبەت ئەگەر گۆشتەکەی دابەشکردو ئێسکەکانی شکاند ئەوەش میراتییە، ئەگەر سەربیڕی هەتا بیخواتو کەس نەخۆشنەبوو ئەوەش گەنجینەیەکە دەیکاتەوە یان دادپەروەرییەکە فەزڵو چاکەی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر حوشترەکە لەناوەڕاستی شاردابوو یاخود لەنێو کۆمەڵە خەڵکێدابوو ، پیاوێکە هەڵمەت دەباتو کوشتار بەرپادەکات یاخود دەمرێت ، ئەگەر سەربڕاو زوڵمو ستەمی لێکراوە، ئەگەر بەزیندویتی پێستی لێکرایەوە دەستەلاتو شکۆمەندی لەدەستدەداتو ماڵوداراییشی دەڕوات.

*ئەگەر حوشترێکی بینی گۆشت دەخوات یان هەڵدەکوتێتە سەر ماڵانو لەهەر ماڵێکدا خواردنێکی نادیار دەخوات بەلاو نەهامەتییە روو لەخەڵکیدەکات، ئەگەر دوایان بکەوێت

فەرمانڕەوا یان دوژمن یاخود لێشاوو لافاوێکە زیان بەخەڵکی دەگەیەنێت.

*ئەگەر حوشترێك بکوژێت یان ئەندامێکی بشکێنێ یاخود هیلاکوماندوبێتو پەکیخست بەئەندازەی ئەوە دەبێت کەدەستی لێدەدات، هەروەها فیلو زەڕافەو حوشترمورخ لەو بابەتەیە.

*رەوگە حوشتری قەتارەبەستوو لەزستاندا بەڵگەیە لەسەر بارانبارین.

*هەروەها دەڵێن: سواربوونی حوشتری عەرەبی (حەج)کردنە.

*ئەگەر لەسەر حوشترێك بکەوێتەخوارەوە هەژاری رووی تێدەکات.

*ئەگەر حوشترێکی بریندارکرد نەخۆشدەکەوێت ، ئەگەر بکەوێتە ژێرپێلەقەی حوشتری شێتەوە غەموپەژارە رووی تێدەکاتو ناکۆکی دەکەوێتە نێوان خۆیوپیاوێکیترەوە.

*ئەگەر حوشترەکە بەلەسەبوو غەمو پەژارە رووی تێدەکات لەلایەن دوژمنێکی بەهێزەوە ، ئەگەر رێشمەی حوشترێکی گرتو بەکێشیکرد بۆ شوێنو جێگەیەکی ناسراو پیاوێکی خراپ رێنوێنی دەکات بۆچاکە.

*هەروەها دەڵێن: بەکێشکردنی حوشترو رێشمەگرتنی بەڵگەیە لەسەر هاتنی هەندێك لەسەرکردە بۆلای.

*ئەگەر حوشترێکی لەوەڕاند دەستەلاتێکی پێدەدرێت بەسەر عەرەبدا.

*ئەگەر بینی پێستەی حوشتر هەڵدەگرێتماڵێکەو دەمێنێتەوە.

*ئەگەر دوو حوشتری بینی کێشمەکێشدەکەن جەنگو شەڕ بەرپادەبێت لەنێوان دوو پادشا یان دوو پیاوی مەزندا.

*ئەگەر سەری حوشترێکی قەڵەوی خوارد غەیبەتی پیاوێکی گەورە دەکات.

*سواربوونی حوشترو رۆیشتن پێوەی سەفەرکردنە.

*ئەگەربینی حوشتر دەدۆشێ ماڵوداراییەکی حەرام بەدەست دەهێنێت.

*ئەگەر بینی گۆشتی حوشتر دەخوات نەخۆشدەکەوێت.

*ئەگەرگۆشتەکەی بەدەستبهێنێتو نەیخوات ماڵێك بەدەستدەهێنێت بەهۆی حوشترەوە.

*پێستەی حوشتر میراتییە.

(نابلسی)دەڵێت: حوشتر لەخەودا غەمو پەژارەیە.ئەگەر بینی سواری حوشترێك بوەو گوێڕایەڵو رام بوە بۆی لەلایەن پیاوێکی عەجەمیەوە پێداویستیەك بەدەستدەهێنێت، ئەگەر پیاوەکە عەرەببوو (حەج)ی بەنسیب دەبێت، ئەگەر لەرێگە دابەزی نەخۆشدەکەوێتو ناتوانێت سەفەر بکات، ئنجا چاکدەبێتەوەو کاروباری بۆ ئاسان دەبێت.

*ئەگەر بەحوشترێکەوە گەڕا غەموپەژارەو نەخۆشی لێیدەدات یاخود کێشەو ناکۆکی بۆ دروستدەبێت لەگەڵ پیاوێکی نەزاندا ، ئەگەر بۆی رامنەبوو غەموپەژارەی لەلایەن دوژمنێکی بەهێزەوە پێدەگاتو بەوئەندازەیە، ئەگەر رێشمەکەیگرتو بەرێگەیەکدا بردی پیاوێك رێنمویی دەکات بۆ چاکەو خێر، ئەگەر لەرێگەی خۆیەوە نەیبرد روو بەخراپە دەبیات، گرتنی رێشمەی حوشتر بەڵگەیە لەسەرئەوەی کاروباری پیاوێکی بەدەستەو لەسەرجەم کاروبارەکاندا بەگوێی دەکات.

*حوشتری رامکراو دوژمنێکی دەوڵەمەندە.

*ئەگەر لەخەودا بینی رەوگە حوشترێکی کرێی دڵی دوژمن رادەگرێتو بەگەرپیاندەخات هەتا گوێڕایەڵبن ، ئەگەر سوار یەکێکیانبوو سەفەرێکی دووردەکات، دەگونجێت نەخۆشبکەوێت، هەروەها ئەگەر بەپاڵکەوتوویی بینی، ئەگەر لەنێو کێڵگەو سنووری خۆیدا بینی خێروچاکەو خۆشی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر کۆمەڵە حوشترێکی زۆری بینی لەولاتێکدا مردنو جەنگ لەو ولاتەدا بلاودەبێتەوە، ئەگەر بوو بەخاوەنی دەستەلاتو هێز بەدەستدەهێنێتو کۆمەڵە پیاوێك دێنە ژێردەستیو زەفەر بەدوژمنەکەی دەبات.

*ئەگەربینی لەسەرپشتی حوشتر کەوتەخوارەوە هەژاردەکەوێت.

*ئەگەر دوو حوشتری بینی کێشمەکێشیانکرد جەنگو شەڕکەوتەوە لەنێوانیاندا جەنگو شەڕ بەرپادەبێت لەنێوان دوو پادشادا.

*ئەگەر حوشترێکی بینی دەجەنگێت لەگەڵو یەکێك لەئەندامەکانی دەشکێنێ شکستو نسکۆیەك رووی تێدەکات لەلایەن دوژمنەکانیەوەو دەجەنگن لەگەڵی هەتا شکست دەهێنن لەسەر دەستیاندا.

*ئەگەربینی حوشترێکی سەربڕی پشوو ماندودەرکردن بەدەستدەهێنێت و زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکەیداو سەردەکەوێت بەسەریا.

*حوشتر بەڵگەیەلەسەر:

+سەوڵی بەلەم.

+خێرایی کەشتی.

*بۆئەوەی سەفەردەکات بەڵگەیە لەسەر هێمنی سەفەرو خێرایی بەپێچەوانەی ئەوەوە شێوازی سەفەرەکەشی لەوحاڵەدا یاریدەکات کەحوشترو مانگای تێدا دەبینێت ، بۆسەرجەم خەڵکیش لەگەڵ کەسێکدا هەڵهاتبێ و ایکردبێ یا لەجەنگ و بەربەرەکانیدابێت یان بۆ دەستبەرداری هاوڕێیەتی و هاوەڵان بەڵگەیە لەسەر جێگیرنەبوون و ترسنۆکی لەراوبۆچووندا.

*ئەوەی رەوگە حوشترێك بەدیبكات هاتوونەتە نێو شارەکەی نەخۆشی تاعون لەو ولاتەدا بلاودەبێتەوە.

*ئەوەی حوشترێك لەماڵی خۆیدا بکوژێت لەوماڵەدا پیاوێك كتوپڕ دەمرێت.

*ئەوەی حوشترێکی تێکسمڕاوی قەڵەو ببینێت لەماڵیان سەربڕاوە میوانداری خەڵکی بەرێزو شکۆمەند دەکات.

*ئەگەربینی وەك حوشتری لێهاتووە بارویارگەی خەڵکی دەخاتە ئەستۆی خۆی.

*خواردنی گۆشتی حوشتر بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی، هەروەها وتویانە هیچی تێدا نییە.

*ئەگەربینی بوە بەخاوەنی حوشتر چارەنووس و دەرەنجامێکی باشی دەبێت و ئاین و بیروباوەڕی باشدەبێت.

*ئەگەر رەوگە حوشترێك ببینێ دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کرداری خراپ و نابەجێ.

*حوشتر بەڵگەیە لەسەر ماڵ ولانەو کەشتی چونکە هۆکاری سەفەری وشکانییە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مردن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+هاوسەری رام و هاوڕا.

+خەشم وقین و دڵپیسی.

+تۆڵەسەندنەوە گەرچی پاشماوەیەکیش بێت.

+پیاوێکی بەئارام.

+بۆئەوەی پەلەیەتی هێواشی حاڵ وبارە.

+رزق وڕۆزییە.

*حوشتری تێکسمڕاو بەڵگەیە لەسەر خەڵکی شکۆمەند یاخود ئەوانەی

سـەفەر دەكـەن وەك بازرگـان كەبەوشكانیو دەریادا دەڕۆن.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر عەجەمو خەڵكی غەریب.
*هەروەها بینینی بەڵگەیەلەسەر:
+غەموپەژارەو تالآنی ماڵوداراییی.
+تالآنی بۆماڵو منداڵ.
+ شەیتانو ئەهریمەن.
+پیاوێكی نەزانو دووڕوو.
*ئەگەر بینی حوشتر دەدۆشێ ماڵو سامانو دارایی لەلایەن فەرمانڕەواوە بەدەستدەهێنێت ، ئەگەر دۆشیو خوێنبوو ماڵو داراییەكی حەرام بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر بینی حوشترێك دەباتە نێو شوێنو جێگەیەكی تەنگەبەرەوە ئەو شوێنەش نەیگرێتەخۆ بەڵگەیە لەسەر داهێنانو بیدعەیەك.
*ئەگەر بینی دەكەوێتە ژێرپێڵەقەی حوشترێك نارەحەتیو غەمو پەژارەو ملكەچی رووی تێدەكات ئەگەر كرێكاربوو غەرامە دەكرێت.
**حوشترمورخ (نەعامە)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ژنێكی گوندنشینە بۆ یەكێك ببێت بەخاوەنی یاخود سواری ببێتو خاوەن جوانیو ماڵو سامانە.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر خەساندن چونكە درێژەو لەبەرئەوەی نەباڵندەو نەئاژەڵە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:
+رەسەن.
+كەڕ.
*هەروەها نازونیعمەتە بۆیەكێك بیكڕێ یاخود ببێت بەخاوەنی ئەگەر نەخۆشی نەبێت، ئەگەر نەخۆشیداربوو مردنیەتی.
*ئەگەر حوشترمورخێكی لەماڵەكەیدا بینی تەمەنی درێژدەبێتو نازو نعمەتی بەردەوامدەبێت.
*بەچكەی حوشترمورخ كورەو هێلكەكەشی كچە.
*ئەگەر دەستەلآتدار بینی بوە بەخاوەنی حوشترمورخ خزمەتكارێكی خەسێنراوی هەیە پارێزگاری لەكچەكان دەكات.
*نێرینەی حوشترمورخو سەربڕینی لەدواوە كاری نێربازییەو سواربوونیشی كاری پۆستەچێتییە.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی سواری حوشترمورخێ بوە حەرام دەگرێتەبەر یان دەشتو دۆڵێك.
*ئەگەر بینی حوشترمورخێكی سەربڕی شقڵی كچێك دەشكێنێ.
*ئەگەر حوشترمورخێكی بەدستهێنا دەچێتە لای ژنێك.

*ئەگەر پەڕەکانی بەدەستهێنا ماڵو سامان لەپیاوێکی دەشتەکییەوە بەدەستدەهێنێ.

**حوشترەوان:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڕێوەبەری سەربازانە، بینینی بەڵگەیە لەسەر سەفەرو مردنی نەخۆش.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کەشتیەوانو بەڕێوەبەری کەشتی.

## ح ە

**حەپسە (ڕەزای خوای لێبێت)**[1]**:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کارو ڕووداوێکی خراپو دڵتەزێن.

*هەر پیاوێک هاوسەرێکی پێغەمبەر (ﷺ) ببینێو خۆی ڕەبەن بێت هاوسەردەگرێ لەگەڵ ژنێکی باشو ڕەوشتبەرزدا، هەروەها ئەگەر ژنێک یەکێکیان ببینێ بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی چاکو باش هەروەها ئەو بابەتەش لەباسی هاوسەرانی پێغەمبەردا(ﷺ) تۆمارکراوە.

**حەج:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی دەچێت بۆ (حەج) لەکاتی خۆیدا (حەج)ی لەچارەدەنوسرێت ، ئەگەر نەخۆشبوو لەشساغدەبێتەوە ، ئەگەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە، ئەگەر ترسابوو دڵنیادەبێت ، ئەگەر کاروبارەکانی ئاڵۆزو قورسبوون ئاسانو سووکدەبێت، ئەگەر لەسەفەردابوو لەسەفەرەکەیدا پارێزراو دەبێت، ئەگەر بازرگانبوو سوودو قازانج دەکات،ئەگەر لەپۆستو دەسەڵات لابرابوو بۆیدەگەڕێتەوە، ئەگەر سەرگەردانبوو ڕێنموونی دەکرێت ئەگەر غەمباربوو دەرووی لێدەکرێتەوە.

*ئەگەربینی خەریکە دەچێت بۆ (حەج) بەلام لەکیسیچوو گەردەستەلأتداربوو لەکاردەخرێ، بازرگانبوو زەرەردەکات، گەشتیاربوو ڕێگەی لێدەگیرێت، لەشساغیشبوو نەخۆشدەکەوێت.

*ئەگەربینی(حەج)و (عەمرە) دەکات تەمەنی درێژدەبێتو لەسەر کاروبارەکانی جێگیردەبێت.

*ئەگەر تەوافیدەکرد بەدەوری (کابە)دا هەندێك لەپێشەوایان بڕیارو فەرمانێکی پیرۆزی پێدەبەخشن.

*ئەگەر بەدەوری شاری (مەککە)دا سووڕایەوەو تەوافیکرد دەچێتە لای کەسێکی مەحرەم پێی.

---

[1] **حەپسە(ڕەزای خوای لێبێت):** هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ)و کچی (عومەر)ی کوڕی (خەتتاب)ە (ڕەزای خوایان لێبێت).

*ئەگەر لەنێو (حەرەم)دا ویردی (لبیك اللهم ...)ی دەوتەوە زەفەر بەدوژمن دەبات و لەترس و بیم دڵنیادەبێت، خۆئەگەر لەدەرەوەی (حەرەم) ئەو ویردەی دەوتەوە هەندێك لەخەڵكی دەیترسێنن و زاڵدەبن بەسەریا.

*ئەگەربیینی (حەج)واجبە لەسەری بەلاّم نایكات بەڵگەیە لەسەر ناپاكی لەئەسپەردەدا، هەروەها سوپاسگوزارنییە لەسەر ئەوبەخشش و نیعمەتانەی خودا پێیداوە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودابینی (حەج)دەكات و بەدەوری (بیت)دا دەسووڕێتەوەو ڕێورەسمەكانی ئەنجامدەدا چاكی ئاین و جێگیربوونیەتی لەسەركاروبارەكانی و پاداشتێكە لەشێوەی ڕزق و ڕۆزیدا پێیدەگات و قەرزیشە دەیداتەوە یان ئەمانەتە دەیگەڕێنێتەوە بۆ موسوڵمانان.

*(حەج)بەڵگەیەلەسەر:
+دووردڵی لەمەبەست و مەرامدا.
+چاكەكردن لەگەڵ دایك و باوك و مامۆستا.
+كۆچكردن.
+سەردانی زانایەك یاخود خواناسێك.

*ئەگەر بێكاربوو لەخزمەتگوزاریدا هەوڵدەدات.

*دەگونجێت (حەج)بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرگیری كەسێكی رەبەن بۆ فەرمانڕەواو پادشاش قەڵغان و پارێزەرە لەدوژمنانی و ملكەچكردنی خراپەكارانەو ئازادكردنی ولاّتی بێباوەڕانە.

*دەگونجێت (حەج)بەڵگەبێت لەسەر غەزوە.

*ئەگەر خوێندكاری زانیاریبوو ویست وخوازی خۆی بەدەستدەهێنێت، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت، نەخۆش و سەرپێچیكاربوو تەوبەدەكات، هاوسەرداربوو ژنەكەی تەلاّقدەدات یان تێكەڵ دەبێت لەگەڵ كەسانێكدا سوودی پێدەگەیەنن لەدنیاو ئایندا.

*ئەگەر بێباوەڕبوو موسوڵماندەبێت.

*ئەگەر بەسواری چوو بۆ (حەج) كۆمەك و یارمەتی پێدەبەخشرێ.

*ئەگەر بەسواری حوشترێكەوەبوو تێكەڵاوی لەگەڵ خەڵكێكی خۆشگوزەران دەكات.

*ئەگەر ولاّخەكەی لێخوڕی بەیارمەتی ژنێك دەگات پێی.

*ئەگەر سواری فیلێکبوو بەیاوەری فەرمانڕەوایەك (حەج)دەكات.

*ئەگەر بەپێی سەفەریكرد سوێندێكدەخواتو دەبێت كەفارەتی سوێندەكەی بدات.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر رزقو رۆزیو دەستكەوتو گەڕانەوە لەسەفەرو دەروولێكردنەوە دوای غەمو پەژارە یان لەشساغی دوای نەخۆشیو گەڕانەوە بۆ حالو باری رابردووی.

*ئەگەر توێشوویەكی لەگەل خۆی هەلگرتبوو بەلگەیەلەسەر خواناسی.

*دەگونجێت توێشوو هەلگرتن بۆ هەژار بەلگەبێت لەسەر دەولەمەندیو بۆقەرزار قەرزدانەوەبێت.

*ئەگەر (حەج)بكاتو هیچكارێك ئەنجامنەدات لەرێورەسمەكانی (حەج) روو لەفەرمانڕەوایەكدەكات بۆ پێداویستییەك.

*ئەگەربینی دەچێتە دەرەوە بۆ (حەج) بەتەنیا خەلكی خواحافیزی لێدەكەنو دەگەڕێنەوە بەلگەیە لەسەر مردنی.

**حەرمل( گیایەكە )**: (ئیبن سیرین) دەلێت: مالێكە مالو دارایی خراپی پێ چاكدەكرێت.

**حەسیر( راخەری بچووك )**: (ئیبن سیرین) دەلێت: حەسیر بەلگەیە لەسەر خزمەتكارو كۆڕو دانیشتنی دەستەلاتدارو فەرمانڕەوا، عەرەب پادشاو فەرمانڕەوا بەحەسیر ناودەبەن.

(نابلسی)دەلێت: ئەگەر بینی لەسەر حەسیر دانیشتوە رووداوێك لێی روودەدات، غەمو پەژارە دەخواتو پەشیمان دەبێتەوە لێی.

*ئەگەر بینی حەسیرێكی تێوە پێچراوە گەمارۆ دەدرێت یاخود میزی دەگیرێت.

**حەشیش (گژوگیا )**: (نابلسی)دەلێت: حەشیش لەخەودا بەلگەیە لەسەر چاكی ئاینو بوونی خێر.

*ئەگەر بینی حەشیش لەلەپی دەستی دەڕوێت هاوسەرەكەی لەگەل یەكێكیتردا دەبینێ.

*ئەگەر حەشیشی بینی بەپشتی دەستیەوە روابوو دەمرێتو حەشیش لەسەر گۆڕەكەی دەڕوێت.

*ئەگەر گژوگیای بینی لەشوێنی خۆیدا نەڕوابوو وەك مزگەوتو مال بەلگەیە لەسەر دروستبوونی پەیوەندی خزمایەتی.

*ئەگەر گژوگیای لێڕوا فەرووپیت و چاکە بەدەستدەهێنێت بەمەرجێك گژوگیا چاوو گوێچکەی نەگرێتەوە.
*ئەگەر گژوگیای لەدەستی خەڵکیدا بینی یاخود لەجۆگەکاندا ڕوا ساڵێکی پڕخێرو بەرەکەت دەبێت.
*ڕوانی گژوگیا بەسەرجەستەوە دەوڵەمەندبوونە، ئەگەر گژوگیا بڕوێت لەشوێنێکدا سوودی نەبێت خراپەو ئەگەر کەسەکە نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر مردنی.
*گژوگیا خۆراکی ئاژەڵە وەك ماڵو دارایی دنیا هەموو مرۆڤێك بەپێی خۆی ڕزق و ڕۆزی هەیە.
**حەق (ڕاستی)** : (نابلسی)دەڵێت: حەق و ڕاستی لەخەودا ئەگەر مرۆڤ بینی و گوێی لێبوو وەك سەرهەڵدانی نور یاخود گوێبیستبوونی قورئانی پیرۆز بەڵگەیە لەسەر شوێنکەوتنی ڕێگەی ڕاست و پشتکردنە ناحەق و بەتاڵ و شوێنکەوتوانی ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر مردنی نەخۆش و بەجێهێنانی حەق و گەڕانەوەی لەسەفەر.
**حەلاڵ( دروست )**: (نابلسی)دەڵێت: حەلاڵ بۆیەکێك بەدەستی بهێنێت بەڵگەیە لەسەر تەوبە بۆ تاوانباران و باوەڕهێنانی ناموسوڵمان و واتووی ئەوەش گرنگیدانە بەحەرام.
**حەڵوا ( شیرینی )**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: حەڵواو خواردن ئەگەر مرۆڤ بینی دەیخوات بەڵگەیە لەسەر خۆشی ژیان و قوتاربوون لەمەترسی و بەدەستهێنانی خۆشی و شادی.
(نابلسی)دەڵێت: حەڵوا بەڵگەیە لەسەر:
+دڵسۆزی لەئایندا.
+قوتاربوونی زیندانی.
+گەڕانەوەی موسافیر.
+چاکبوونەوەی نەخۆش.
+هاوسەرگیری ڕەبەن.
+ڕێنومایی و تەوبەو زانیاری و قورئان.
+منداڵبوون.
+خزمەتکارو بەردەستی ڕێزدار.
+ڕزق و ڕۆزی حەلاڵ.
*گەزۆو ئەوەی لێدروستدەکرێ لەنیعمەت و فەڕو خێر.
*حەڵواو شیرینی سالانە بەڵگەیە لەسەر ئامادەبوون لە(حەج) یان نوێکردنەوەی دەستەلات بۆ جێنشینێکی دادپەروەر.
*حەڵوای هەلاوساو گڤکردو درۆو قسەی نابەجێیە.
*حەڵوای سوورەوەکراو بەشداری بەسوودە.

*هەموو حەڵواو شیرینیەك مرۆڤ زۆری لێبخوات نەخۆشییە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چاكبوونەوە لەنەخۆشی، هەموو ترشێكیش بەهەمان شێوەیە خواردنی نەخۆشی مرۆڤ زیاد دەكات.
*هیچ خێرێكی تێدا نییە ئەگەر مرۆڤ بیخوات یاخود خواردنی فالودە دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی ئیفلیجی.
*ئەو شیرینیەشی لەچوار ماددە دروستدەكرێت: هەنگوین‌و شەكرو گەزۆو خورما ، ئەگەر مرۆڤ بیخوات لەكاتی خۆیدا باشەو قوتاربوونە لەمەترسی.
*هەروەها حەڵوا بەڵگەیە لەسەر رزق‌و رۆزی حەلاڵ‌و گوفتاری شیرین بۆ باوەڕدارانیش تام‌و چێژی باوەڕەو بۆ بێباوەڕو خراپەكاریش چێژو تامی دنیایە.
**حەڵواچی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: حەڵواچی پیاوێكی چاكەكاری نەرم‌و نیانە ئەگەر بەهاو نرخی خورماكەی وەرنەگرێت ئەگەر نرخ‌و بەهای وەرگرت رووپامابیە.
**حەڵوافرۆش:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پیاوێكی لەبز شیرین‌و رەوشت بەرزە.

*هەروەها دەڵێن: دادپەروەری زانست‌و زانیارییە.
*پیاوێكە جێگەی خۆیدەكاتەوە بەناكۆكی‌و شەڕو ئاژاوەخستنەوە لەنێوان خەڵكیدا.
(نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر:
+زانیاری.
+گرێبەستی هاوسەرگیری.
+نوێكردنەوەی پلەوپایەو دەستەلات.
+منداڵ.
*پیاوێكی نەرم‌و نیانە ئەگەر پارە وەرنەگرێت، خۆئەگەر پارە وەربگرێت قسە پێشدەخات بەسەر ماڵ‌و داراییدا.
**حەماڵ:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی بارێكی قورس‌و گران هەڵدەگرێت بەو ئەندازەیە تووشی دەبێت، هەروەها كەسێكە غەم‌و پەژارەو خەون‌و هیواو ئاواتی هەبێت.
**حەمام (گەرماو):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: حەمام بەڵگەیە لەسەر داوێن ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شوێنی زیناكاران‌و شەڕەنگێزان‌و دەنگدابڕین‌و شەڕوپێكدادان هەروەك شوێنی خراپەو بەد رەوشتی‌و لانەو ماڵی فەرمانڕەواو دەستەلاتداران‌و ئەوەی خەڵكیدەبات بۆ شوێنی خراپەو ملكەچی بەردەركی ستەمكارانیان دەكات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەریاو نەخۆشیو دۆزەخ، ئەوەی خۆی ببینێ لەحەمامدا یاخود یەکێکیتر بینێ تێیدا، ئەگەر مردوویەك لەحەمامدا بەدیبکات لەدۆزەخو ئاگردایە، چونکە دۆزەخ دەرگاو پلەی جیاواز جیاوازی تێدایە.

*ئەگەر لەحەمامدا نەخۆشێك بەدیبکات تەماشای حاڵو باریدەکات، ئەگەر بینی لەدەرەوە لەرزو تای لەکۆڵ دەبێتەوەو پاکدەبێتەوە، ئەگەر خۆی شت بەسەلامەتی قوتار دەبێت لێی، بەڵام ئەگەر نەخۆشیەکەی سەرمابوو زیاددەکات لەسەریو دەترسێ لەخۆی ئەگەر خۆیشتو جلوبەرگی سپی پۆشیبوو بەپێچەوانەی سروشتی خۆیەوەبوو شتنو کفنکردنو خستنەنێو دارەمەیتە بۆی، ئەگەر لەزستاندابوو مەترسی ئیفلیجبوونی هەیە.

*ئەگەر بینی دەچێتە نێو گەرماو پێچەوانەی ئەوەیە کەباسکرا ، ئەگەر نەخۆشنەبوو بەڵام شەڕو ئاژاوەی هەبوو لەگەڵ کەسێکدا یان پێداویستی هەبوو بەفەرمانڕەوایەك بڕیار لەبەرژەوەندی ئەو دەبێ بەپێی چوونەنێو گەرماوەکەو توندی گەرماو سەرماکەی یاخود هەڵخلیسکانو خۆ تەڕکردنی.

*ئەگەر هیچکام لەوانەنەبوو بەڵام خەوبینەر ڕەبەنبوو هاوسەر دەگرێ یان ئامادەی ئاهەنگی ژنهێنان یان پرسەو ماتەمینی دەبێت.

*دەگونجێت ئارەقکردنەوە بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو ماندوبوونو نەخۆشی لەگەڵ هەڵمی گەرماوو گەرماکەی، ئەگەر لەنێو گەرماوەکەدا هیچ جلوبەرگێکی لەبەردانەبوو ڕووداوەکان لەڕێگەی هاوسەرەکەیەوە یان لەڕێگەی خزمو کەسی ژنەکەیەوە دەبێت، ئەگەر پۆشتەبوو لەگەرماوەکەدا لەڕێی کەسێکی بێگانەوەیە یاخود کەسی نزیکی خۆیەوە وەك دایکو کچو خوشك ئەو جموجووڵانەی نێوگەرماوەکەش بەپێی پلەوپایە وابەستە دەکرێت.

*ئەگەر بینی لەدەروازەو دەرگایەکەوەچووە نێو گەرماوەکە یاخود لەنێو گەرماوەکەدا شێر هەبوو یان مار ژنێك بەچەشنی خۆڕازاندنەوە دێتەلایو یەکدەگرن لەگەڵ خەڵکی خراپەکار.

*هەندێکدەڵێن: حەمام لانەو شوێنی خراپەیە ، ئەوەی بچێتە نێوی غەمو پەژارەیەکی کاتی ڕووی تێدەکات لەڕێی ژنانەوە.

*حەمام ناوەکەی لە(حمیم)ەوە هاتوەو بەمانای (حم)و هاتوە (قرچە - گەرما) کەبەمانای زاوا یان نزیکهاتووە، ئەگەر ئاوی گەرمی تێدا بەکارهێنا غەمو پەژارە رووی تێدەکات لەلایەن ژنانەوە، ئەگەر غەمو پەژارەداربوو چوە نێو حەمام لەغەمو پەژارەی خۆی قوتار دەبێت.

*ئەگەر کۆڕو کۆمەڵی لەحەمامدا بەست داوێنپیسی لەگەڵ ژنێکدا ئەنجامدەداتو باسیدەکات، چونکە حەمام شوێنی دەرخستنی عەورەتو جێ عەیبە.

*ئەگەر حەمامێکی بیناکرد داوێنپیسی ئەنجامدەداتو رۆدەچێت تێیدا، ئەگەر حەمامەکە گەرمو خۆشبوو خانەوادەو زاواو خزمو کەسەکانی لەگەڵ هەندێك ژنی خزمیدا یارمەتیدەرو بەسۆزو بەزەیی دەبێت بۆی ، بەلام ئەگەر حەمامەکە ساردبوو تێکەڵی نابنو هیچ سوودو کەڵکی پێناگەیەنن.

*ئەگەر حەمامەکە زۆرگەرمبوو خودو رەوشیان توندو رەق دەبێت هیچ خۆشیو شادییەکیان لێبەدی ناکرێت بەهۆی توندو تیژیانەوە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر حەمامی گەرمی بینی پیاوێك هەڵدەدات لەژنەکەی نزیکبێتەوەو ئەویش ماندو دەبێت لەرێگریداو بۆی نارەخسێت ، ئەگەر جورنەی حەمامەکە یان تەشتی ئاوەکە پڕبوو ئاوی لێرژاو گەیشتە ناوەراستیماڵەکە ژنەکەی خەشمو قینی هەڵدەستێنێ.

*ئەگەر حەمامەکە ساردبوو خاوەنی خەوەکە هەژارو کەمدەرامەتە دەستی ناگات بەوەی خوازیاریەتی ، خۆئەگەر گەرمو خۆشبوو بەدڵیبوو کاروبارەکانی بەباشی و بەدڵی خۆی دەبێتو بەماڵو دارایی دەستدەکەوێو دەروازەو دەرووی لێدەکرێتەوە.

*ئەگەر زۆرگەرمبوو کەسێکی کاسبو بژێوی پەیداکار دەبێت بەلام رێکخستنو بەڕێوەبردنی کاری نابێتو لای خەڵکیش بەباش باسناکرێت.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی دەچێتە نێو حەمامێکەوە بەلگەیە لەسەر لەرزوتا.

*ئەگەر بینی لەحەمامدا ئاو دەخواتەوەو ئاوەکەش زۆرگەرمە یاخود ئاو دەکرێت بەسەریاو خۆی دەشوات لەسەر شێوەی خۆشتن غەمو پەژارەو نەخۆشیو ترسانە بەپێی ئەو ئاوە گەرمەی کەهەیە.

*ئەگەر لەناوەڕاستی حەمامدا ئاوی خواردەوە لەرزوتای تووشدەبێت، ئەگەر لەئاوی ساردیخواردەوە ئاوبەنگدەکات.

*ئەگەر بینی بەئاوی گەرم خۆی دەشوات و لەسەر سەفەربوو ، سەفەرەکەی بۆ جێبەجێ نابێت ، ئەگەر کرێگرتەی مرۆڤێکبوو داوای سوودو قازانجی لێدەکردو هیچ دەروویەکی بۆ نییە بەپێی ئایەتی: ﴿وَإِنْ يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ﴾ (الكهف: ٢٩).

*ئەگەر هەریەك لەحەمامو خۆشۆردنیو هاتوچۆو هاتن تێدا کۆبێتەوە خۆشۆردنەکە هەڵبژێرە لەگەڵ هاتوچۆو واز لەحەمامەکە بهێنە چونکە لەلێکدانەوەدا بەهێزترە.

*ئەگەر لەشوێنی خۆیدا گەرماوێکی نادیاری بینی بەڵگەیە لەسەر ژنێك خەڵکی باسیدەکەن.

*دەگێڕنەوە پیاوێك لەخەودا دەبینێ لەحەمامدا هەڵدەخلیسکێ بۆ خەولێکدەرەوەیەکی دەگێڕێتەوە، ئەویش پێی دەڵێت: ناڕەحەتیو نەهامەتێك ڕووت تێدەکات ، ئنجا پاش ماوەیەك ئەو پیاوە قاچی لەحەمامدا هەڵدەخلیسکێو دەیپێکێ.

*توونی حەمامیش فەرمانو بارێکی جوانە لەهەموو حاڵو بارێکدا ، ئەوەی ببینێ توونی حەمام بینادەکات دەسەڵاتو پلەوپایە بەدەستدەهێنێت، ئەگەر تاو نەدرابوو خەڵکی بەکاروبارێکی مەزنەوە سەرقاڵدەکات.

*ئەگەر حەمامەکە گەرمو گوڕو خۆشبوو خانەوادەو زاواکەیو هەندێك لەژنانی خزمی یارمەتیدەرن بۆیو دڵیان پێی دەسووتێ، ئەگەر حەمامەکە ساردبوو تێکەڵی نابنو سوودیان لێوەر ناگرێت.

*ئەگەر حەمامەکە زۆرگەرمبوو خووڕەوشتیان توندوتیژەو بەهۆی ئەو توندو تیژییەوە هیچ شادییەکیان لێبەدیناکات.

*حەمام بەڵگەیە لەسەر دەرگاوانی دۆزەخ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ماڵو لانەی فەرمانڕەواو بەڕێوەبەرەکەشی دادوەرە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر زیندانو دەرگاوانەکەشی زیندانەوانە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر دەریاو بەڕێوەبەرەکەشی کەشتیەوانو بەرپرسییەتی.

*گەرماو بەڵگەیە لەسەر:

+شوێن و لانکەی وەرگرتنی زانیاری.
+ژن و بژێوی پەیداکەری یاخود گرێبەستکار.
+شوێنی داوێنپیسی و بەرپرسەکەشی پیاوێکی بەدرەوشتی سووک و رسوایەو هەڵدەستێت بەرێکخستنی نێوانی پیاوو ژنی داوێنپیس و بەدەویت ناوزەدکراوە.
+زیندان و زیندانەوان.
+دەریاو کەشتیەوان.
+شوێنی زانیاری و سەنگەرو مزگەوت و بازاڕ شوێنی بژێوی پەیداکردن و زەرەرە.
+ساڵ.
+تەویەی بەدخوو رێنومایی سەرگەردان و دەوڵەمەندەو بۆ هەژاریش چاکبوونەوەی نەخۆش و ناساغ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+ماڵی فەرمانڕەواو خۆرووتکردنەوەو سەردەرخستن و ماڵ و دارایی تالآنکردن.
+دەریاو بازاڕی پارەگۆڕینەوە.
*ئەگەر نەخۆشێك چوە نێو بازاڕو خۆی شت بەشێوەی دروست و گونجاو بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی نەخۆشییەکەی، ئەگەر ئاوێکی خراپ و ناباشی بەکارهێنا بەڵگەیە لەسەر غەم و پەژارەو زیادبوونی نەخۆشی، ئەگەر کەسێکی تەندروستی باش خۆی تێدا شت و خۆی پاککردەوە زانیارییەك بەدەستدەهێنێت بەهۆیەوە رێنومایی دەکرێت یاخود قەرزەکانی دەداتەوە یاخودپەروەردگار لەگوناهو تاوانەکانی خۆشدەبێت ، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێت ، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت ، ئەگەر بەئاو خۆیشت بەجلوبەرگەوە لەگەڵ داوێنپیسێك تێکەڵدەبێت و بەهۆی ئەوەوە ئاینەکەی دەشێوێ.
*ئەگەر مردوویەکی بینی لەحەمامداو لەنزیك گەرماوەکەیبوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەسەری کۆبوەتەوە بەتاییەت ئەگەر جلوبەرگی پیسی پۆشیبوو یا جلوبەرگی پڕزۆلآوی و عەورەتی دیاربوو ئەگەر بینی خەریکە لەحەمام دێتە دەرەوە قوماشێکی بۆنخۆشی پێوەیە بەڵگەیە لەسەرئەوەی خوداوەند لێی بوراوەو چاوپۆشی لێکردووە.
*ئەگەر خۆی لەرۆژدا بینی ئەستێرە دەوریدابوو یاخود لەسەرسەری کۆبوبووەوە بەڵگەیە لەسەرئەوەی دەچێتە نێو حەمام.
*ئەگەر لەخەوەکەیدا گەرمایەکی توند یا سەرمایەکی سەختی پێگەیشت

ناڕەحەتی ڕووی تێدەکات لەحەمامدا چونکە حەمام وەك ئەستێرەی دیار وایە.

*ئەگەر پیاوو ژن لەحەمامدا تێکەڵبوون بەڵگەیە لەسەر جیاوازی حاڵو بارو شکانی دابو نەریتو کەوتنە نێو بیدعەو گومانەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ڕووداوێك لەو ولاتە ڕوودەدات هەتا ژنو پیاو تێکەڵ بەیەکدەبنو جنێویان پێدەدەنو عەورەتیان دەبینن.

*ئەگەر ئاوی حەمامەکە بوو بەخوێنو خەڵکی ئاوشێنی لاشەیان پێدەکرد بەڵگەیە لەسەر زوڵمو ستەمی فەرمانڕەواو دەستەڵاتدار بۆیان لەماڵ زەوتکردندا یاخود چاوپۆشی زانایان لەحەلاڵکردنی کاروباری حەرامکراوو ناپەسەند وەك شکانی ڕۆژوگرتنی ڕۆژی ڕۆژی گومانـاوی(یـوم الشك)، یاخود وەستان لەعەرەفەدا لەڕۆژێکی تردا یان نوێژی نیوەڕۆ بەر لەوەی خۆربگاتە نیوەی ئاسمانو هاوچەشنی ئەوانە.

*دەگونجێت حەمام بەڵگەبێت لەسەر کەنیسە چونکە شوێنی جنۆکەو شەیتانو دیمەنی جیاواز جیاوازە.

*حەوزی (جورنەی) حەمامیش شوێنکەوتەی ئەوەیە کەحەمام بەڵگەیە لەسەری.

*دەگونجێت حەمام بۆ کەسی ڕەبەن بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرو حەوزەکانیشی بەڵگەبێت لەسەر منداڵو خانەوادە یان ماڵو دارایی.

*ئەوەی حەمام بکات بەماڵو لانەی خۆی سووروبەردەوامە لەسەر گوناهو تاوان.

*ئەوەی بچێتە نێو حەمامو خۆی لێبشوات لەغەمو پەژارە قوتاردەبێت کەلەلایەن ژنێکەوە پێی گەیشتوە یان لەقەرزاری.

*ئەگەر گۆرانی وت لەحەمامدا قسەیەك دەکات وەڵامەکەی وەردەگرێت.

*حەمامی تاریك زیندانە، غەزنەی حەمامیش ژنێکی بێخێروبێرە بەهۆی نزیکییەوە لەئاگرەوە.

**حەمامچی( ناتر ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: یەکێکە خەڵکی لەسەر یاخییوونو سەرپێچی کۆکردوەتەوە، هەروەها لەجێی ئەوەیە حەمام بەڵگەیە لەسەری‌و حەمامیش بەڵگەیە لەسەر زۆرشت.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی حەمامچی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر قەرزدانەوەو، ڕەوینەوەی غەمو پەژارەو سەرگرتنی کردارو پاکێتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەستکورتیو نەخۆشی.
*ئەگەر بینی بوە بەحەمامچی یاخود سەرپەرشتی کاروباری حەمامدەکاتو خزمەت بەخەڵکی ناکات لەحەمامدا دەویتەو بەرئەنجامی کاری داوێنپیسەو گوێڕایەڵی خەڵکی ناکاتو هیچ سوودێکی نییە بۆیان، ئەگەر جلوبەرگی سپی لەبەردابوو غەمو پەژارە بۆ خەڵکی دروستدەکات.

**حەوا( سەلامی خوای لێبێت ):**

(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:
+بەرەکەت لەکشتوکاڵو بەروبوومدا.
+خستنەوەی منداڵ.
+بەدەستهێنانی سوودو قازانج لەپیشەسازی وەك چنینو كشتوکاڵو ئاسنگەریو هیتر.
*دەگونجێت بینینی (ئادەم) و (حەوا) بەڵگەبێت لەسەر:
+گواستنەوە لەشوێنێکی پیرۆزەوە بۆ شوێنێکیتر.
+پێهەڵخلیسکانو کەوتنەنێوکاری یاساغەوە.
+گاڵتەپێکردنی حەسوودو غەمو پەژارەو خراپەی دەرودراوسێ.
+خورتەو بۆڵەی هاوسەر.
+وەرگرتنی تەوبەو پەشیمانی لەسەر کاروکردەوەی رابردوو.
*ئەگەر ژنێك (حەوا)ی بینی لەخەودا غەمو پەژارە دەبات بەدڵی مێردەکەیدا بەهۆی ئەو هاوەڵایەتییەی کەوا شیاوو دروست نییە، دەگونجێت خودی خۆی تووشی بەڵاو نەهامەتیەکی گەورە ببێت چونکە (حەوا) یەکەم ژنبوە تووشی خولی مانگانە بوە.
*دەگونجێت دووگیانیو منداڵبوونی چارەسەر بکات.
*دەگونجێت خوداوەند وەچەی نێرینەیساڵحی پێبەخشێ، ئەگەرچی لەمێردەکەی جیاببێتەوە یان لێی جیابووبێتەوە ئەوەدەگەڕێتەوە بۆلای.
*دەگونجێت رزقو رۆزییەکی حەڵاڵی پێببەخشرێ بەهۆی رەنجو ماندوبوونەوە.
*دەگونجێت لەرەچەڵەكو پشتیدا کەسانێکی خوێنڕێژ دروست بنو پیاوکوژبن یا ئەوەی بەشەهیدی دەمرێت.
*ئەگەر (حەوا)ی بینی فریودەخوات بەوتەی ژنێك ، دەگونجێت پیاوێك بێت گوێ لەمشتی ژنەکەی بێت.
*ئەگەر (حەوا)ی بەرووخسارێکی جوانەوە بینی دایکیەتی چونکە (حەوا)

دایکی موسولّمانانە، ئەگەر غەم‌و پەژارە رووی تێکردبێت دەرووی لێدەکرێتەوە، ئەگەر بەگوێی ژنێك رەفتاریکردبێت پلەوپایەو دەستەلاّتی لەدەستدەدات‌و پەشیمان دەبێتەوە.

**حەوز:** (ئیبن سیرین)دەلّێت: حەوز پیاوێکی رێزداری بەسوودە، ئەگەر حەوزێکی پڕی بینی رێزو شکۆمەندی لەلایەن پیاوێکی دلّفراوان بەدەستدەهێنێت، ئەگەر دەستنوێژی گرت لەحەوزەکە لەغەم‌و پەژارە قوتار دەبێت.

(نابلسی)دەلّێت: حەوز لەخەودا پیاوێکی بەدەستەلاّت‌و پایە پیرۆزە، ئەگەر حەوزێکی پڕ لەئاوی بینی رێزومەزنی لەلایەن پیاوێکی دەست‌و دلّفراوانەوە دەستدەکەوێت، ئەگەر دەستنوێژی گرت لێی پشت بەخوا لەغەم‌و پەژارە قوتاردەبێت، ئەگەر ئاوی لێخواردەوە رزق‌و رۆزی لەپادشایەکی بەرێزەوە دەستدەکەوێت.

# خی



## خا

**خـاچ:** (نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا بەڵگەیە لەسەر:

+درۆ.

+دووڕومانی.

+تاوانبارکردن بەزیناو داوێنپیسی.

+شایەتیدانی درۆ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پیاوێکی مەزنو شکۆمەندو جێبەجێکاری ئاین.

*ئەگـەر بینـی خاچـێکی پێیـە هاوسەردەگرێ یان خوداوەنـد کـوڕێکی پێدەبەخشێو دەگونجێـت دەرەنجـامی زینابێت.

*دەگونجێـت خـاچ بەڵگـەبێت لەسـەر هاوسەرگیری نادروست.

*دەگونجێت بینینی خاچ بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو فیتنە.

**خاکەناز:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا هاوسەرە بۆ رەبەنو ناتوانێ نهێنیو ماڵ بپارێزێ.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی غەمو پەژارەو قەرزدانەوە.

*خاکـەناز پیـاوێکی متمانـەدارە پشتگیری لەخواردنی کەسێك یا بـژێوی پێدەکرێ.

*ئەگـەر خاکـەنازێکی بەدەسـتی کەسێکەوە بینـی هـەموو خێرێـك رووی تێدەکات چـونکە خـاكو خـۆڵ لـەزەوی کۆدەکاتەوە.

*هەروەها خاکەناز بەڵگەیە لەسەر ژنو جموجووڵی کاروکردار.

**خانـەقا:** بینینـی خانـەقا بەڵگەیـە لەسـەر سـەفەرو دنیانەویـستیو پارێزکـاریو قورئانخوێنـدنو پووچـەڵبوونەوەی کاروکاسـبیو دەرچوون لەهاوسەرو منداڵ.

*هـەروەها بینینـی خانـەقا بەڵگەیـە لەسەر تەوبەی سەرپێچکارو رێنومـایی بێبـاوەڕو دەرووکردنـەوە لەبـەلاو نەهامەتیدار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی بێن خنکێن.

**خاووسووك:** ئەگەر مرۆڤێك خۆی لەخەودا بەخاووسووك بینی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دووردەكەوێتەوە لەمەبەستو لەبێداریدا روو لەكارو رەفتارێكدەكات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەمانی رزقو نەجەلهاتن.

## خ ت

**ختوكە:** (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی ببینێ ختوكە دەدرێت لەپیشەوكاری خۆی جیادەبێتەوە.

## خ د

**خدر( سەلامی خوای لێبێت ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر (خدر)ی بینی بەڵگەیە لەسەر دەركەوتنو سەرهەڵدانی فەرو خێرو بوون دوای نەبوونیو لەدەستدانی ئەمنو ئاسایش.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هەرزانی دوای گرانی یان بوونو زۆری نازو نیعمەت، لەگەڵ ئەمنو ئاسایش دوای نارەحەتی.

*ئەوەی (خدر) بینی تەمەنی درێژدەبێو (حەج)دەكات.

## خ ر

**خراپە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: هەركەسێك ببینێ هەندێك كەس زوڵمو ستەم لەهەندێكیتر دەكەن فەرمانڕەوایەكی ستەمكار زاڵدەبێت بەسەریاندا.

(نابلسی)دەڵێت: زوڵمو ستەم لەلێكدانەوەدا رێنمونییە ، هەروەك چۆن لێكدانەوەی رێنموونی ستەمو زۆرداربیە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا نادیاربوو مرۆڤ پێی زانی بەڵگەیە لەسەر چارەنووسی خراپو پاشگەزبوونەوە لەئاین ، ئەگەر هەندێك لەكردارەخراپەكانی باسكرد بەڵگەیە لەسەر شەڕ.

## خ ڕ

**خڕپان( هەموو شتێكی خڕ ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: شتی خڕ چاوبرسێتییە ئەگەر لەدەستیدا مایەوە پارەگۆشتێك خواردن بەدەستدەهێنێ، ئەگەردووگی ئاژەڵەكە بەپانی بڕا ژنەكەی ناپاكی لەگەڵدەكات.

*ئەگەر سكی بەپانی بڕا چاوبڕینە نێو پارەی گەنجینەكەیەتی، ئەگەر دەستی بەخڕی كونكرا چاودەبڕێتە ماڵو سامانی براكانی.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بەخڕی کوڵمی کونکرد چاودەبڕێتە ماڵو سامانی کەسوکاری.

*دەگونجێت سمینو کونکردن لەلایەن مارو دووپشکەوە لەسەر ماڵی حەرامبێت پەیدایدەکاتو دەرەنجامی هەر بەخراپ دوایی دێت.

**خ ز**

**خزمایەتی:**(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ژنێکی پیری دەستپاکەو ماڵو سامانی لائەسپەردە دەکرێ.

**خزمەتکار:** بینینی خزمەتکار لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئاژەڵو ئوتومبیل بەهۆی خزمەتی بۆ مرۆڤ، یاخود جۆگەو ئاوەڕۆ بەهۆی دەردانو بەڕێکردنی پیسو پۆخڵی مرۆڤەوە، یان ئەوەی مرۆڤ قەدیدەکات لەحەسیرو راخەرو ...هتد

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+ماڵو دارایی.

+شکۆداریو پلەوپایەو سەرکەوتن بەسەرد دوژمناندا.

*ئەگەر ماچیکرد دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کەشتی.

*ئەوەی ببینێ کیژێکی سپی دەهێنێت، خێرو دەستکەوتی باش لەبازرگانیەکەی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر کچێکی بچووکی کڕی داوای پێویستیەکی خۆیدەکات بەڵام بەهانەی بۆ دەهێنێتەوە.

*ئەگەر ببینێ کچێك بەیانیەك زوو دێت بۆ لای خێرو چاکە رووی تێدەکات، ئەگەر رزقو رۆزی لای دەستەڵاتدار گیرابێت بەدەستی دەهێنێتەوەو ئەگەر کەسێکی ئاوارەو کۆچکردووی هەبێت دەگەڕێتەوە بۆ لای.

*ئەگەر کچەکە ناشیرین بێت رووداوو کارەساتی ناخۆش رووی تێدەکات.

*ئەوەی کچێك ببینێ گفتوگۆ دەکات لەبازاڕدا لەگەڵ خەڵکیو بانگیان دەکات بۆ زیناو داوێنپیسی فیتنەو ئاشووب دادەبارێت بەسەریاندا.

**خزمەتکاری تایبەت:**(ئیبن سیرین)دەڵێت: خزمەتکاری تایبەت پادشایە یاخود مژدەدەرە، ئەگەر لەماڵەکەیدا خزمەتکاری بینیو قاپو قاچاخیان پێبوو ئەوەی نەخۆشبێت نەخۆشییەکەی درێژ دەبێتەوە یاخود شەهید دەبێت.

**خزمەتکاری دەستەڵاتدار:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر جلوبەرگی پیسیان لەبەردابوو مژدەیەو ئەگەر جلوبەرگەکەشیان رەشبوو نەخۆشییە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە پشتگیری خەڵکیدەکات لەسەر ناحەقی.

**خزمەتی هەژارو پیاوچاکان:** خزمەتکردنی هەژارو پیاوچاکان لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پشكو بەشی بەرینو فراوان لای پەروەردگار لەگەڵ کۆتاییو عاقیبەت خێریو هاوەڵایەتی پیاوچاکان، دەگونجێت پلەوپایەی بەرز ببێتەوە.

**خ س**

**خستنە پاڵیەك:** (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی شتێکی خوازراوی باشو خەڵاتی بدرێتە پاڵ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزی ئاسانو حەڵاڵ، ئەگەر کراسێکی خرایەپاڵ هاوسەردەگرێ، ئەگەر رەبەنبوو، ئەگەر ئوتومبیل یا هۆکارێکی گواستنەوەی خرایەپاڵ پلەوپایەیەو پێی خۆشحاڵدەبێت.

**خستنەروو:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەسوپادا دەخرێنە روو ئەوەی دەیخاتەروو تورەیە لێی گوناهێکی گەورەی ئەنجامداوە.

*ئەگەر خرایەروو وایزانی خاوەنی خستنەروو لێی رازییە خوداوەند لێی رازییە.

*ئەگەر بینی خرایەروو گەیشتە بارەگای خوایی کارێك ئەنجامدەداتو ئومێدەواری تەواوییە تێدا، ئەگەر رزقو رۆزی درا ئەوکاروبارە بەدەستدەهێنێو خاوەنی خستنەرووش هاوەڵانی بەسەردەکاتەوەو ناسۆریو غەمو پەژارەکانیان لەسەر هەڵدەگرێ.

*ئەگەر بینی لەخرانەروودا پەسەندبوو لەو شوێنەدا دەمرێت.

*ئەگەر ویستی بخرێتەروو بەڵام نەخرایەروو پارێزراو دەبێت لەوەی دێت بەسەریا.

**خستنی مرۆڤ بەزەویدا لەلایەن جنۆکەوە:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا درا بەزەویدا لەلایەن جنۆکەوە سوو دەخوات، یان سیحرو جادوو ئەنجامدەدات یاخودماڵو دارایی تیادەچێتو غەمو پەژارەدار دەبێ.

**خ ش**

**خشتبڕ:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر غمو پەژارەو ماڵو دارایی کۆکردنەوە بۆ کەسانیتر.

**خشتی قوڕ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵوسامانە بەدەستیدەهێنێتو هەموو خشتێك گوزارشت لەسەد درهەم یا هەزار درهەم یان دە درهەم دەکات بەئەندازەی خەوبینەر.

*ئەگەر دەرنەکەوت ماڵو سامانە، ئەوەی بەخشتی قوڕ دوستدەکرێ بەڵگەیە لەسەر کاری باشو ئاین.

*خشتی قوڕ بەخزمەتکار لێکدەدرێتەوە ، ئەگەر بینی خشتێکی هەڵدایە خوارەوە لەشوێنێکی بەرزەوەو پارچەپارچەبوو خزمەتکارەکەی دەمرێ.

*خشتی قوڕ لەبیناسازیدا خزمایەتییە لەگەڵ بیناسازو منداڵەکانی.

*ئەو خشتەی دەکەوێتە خوارەوە لەبینا مەرگی نەخۆشەکە لەوشوێنەدایە یان جیابوونەوەو کاروبار پەرتەوازەبوونە.

*ئەگەر بینی خشتێك لەشوێنێکدا دوستدەکات پیاوەکانی زیاددەکەن.

*ئەگەر ماڵێکی لەخشتی قوڕ دروستکرد پلەوپایەو دەستەڵات بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی خشت دروستدەکات ترسی مردنی هەیە.

*یەك خشت لەبینادا پیاوێکە لەنێو کۆمەڵێکدا، ئەگەر بینی هەڵکەندرا لەدیوارێك لەو شوێنەدا پیاو یان ژنێك لەدەستدەچێت.

*کۆمەڵێ خشت ئەگەر هیچی پێدروست نەکراو لەبینادا نەبوو دینارو پارەیە.

## خ ن

**خنکانـدن:** ئەگەر بینی لەخەودا دەخنکێ ناچار دەکرێت لەسەر گەیاندنی ئەسپەردەو ئەمانەت.

*ئەگەر لەبارو حاڵێکی نائاساییدابوو بەهۆی ستەمو زۆرلێکردنەوە سزا دەدرێت.

*ئەگەر توند فشاری خرایەسەر داوای کرێی سوودوەرگرتن لەو ئەمانەتو ئەسپەردەیەی لێدەکرێت ، ئەگەر مرد دەبەزێو هەژار دەکەوێت ، ئەگەر ژیا دوای ئەوەی مرد هەژاردەکەوێتو خوداوەند پاداشتی دەداتەوەو، بۆی پردەکاتەوەو دەوڵەمەند دەبێتو سەردەکەوێت بەسەر ئەوەی زوڵمی لێدەکات.

*ئەگەر مرۆڤێك بینی خۆی دەخنکێ بەهەڵواسراوی بەڵگەیە لەسەر:

+غەمو پەژارە.

+لەماڵی خۆیدا نابێت لەگەڵ ئەو شوێنەی خۆیدەیەوێت.

*نەخۆشی خنکێنەر ئەگەر لەگەروویدابوو بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی ماڵو لەکیسچوونی پشوو یان شێوانی فرۆشگاو دوکانەکەی.

*دەگونجێت خنکاندن بەڵگەبێت لەسەر داوالێکردنی قەرزو تەنگ پێهەڵچنینی.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی دەخنکێ ناچار دەکرێت لەسەر بەجێهێنانی ئەمانەت، ئەگەر بەنەخۆشی خنکێنەر مرد هەژار دەکەوێت.

*ئەگەر بینی ژیایەوە دوای مردن دەوڵەمەند دەبێت دوای هەژاری‌و نەداری.

*ئەگەر بینی خۆیدەخنکێنێ خۆیدەخاتە غەم‌و پەژارەوە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا گاڵتەپێکردن‌و ناوبانگە. دەگونجێت بەرزی پلەوپایەبێت ئەگەر حاڵەتەکەی لەخەونەکەدا هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهات خراپترە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر توهمەت‌و لەکەدارکردنی ئابرو مەگەر سنووربێت ئەوجا بەڵگەیە لەسەر قەرزدانەوە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: خنکاندن بەڵگەیە لەسەر ئەنجامدانی بەلاو نەهامەتی‌و سەرپێچییەکی گەورە، مردن لەخنکاندندا مردنە لەسەر بێباوەڕی ، بەلام بێباوەر ئەگەر بینی لەئاودا نوقمدەبێ دڵنیادەبێ بەپێی ئایەتی: ﴿ حتى اذا ادركه الغرق قال آمنتُ ﴾ (یونس: ٩٠).

*ئەگەر بینی نوقم بوەو لەنێو دەریادا دەستەلاتدار تیایدەبات.

*ئەگەر بینی نوقمبوەو جارێك نوقم دەبێ‌و جارێك دێتەوەسەر ئاوەکەو دەست‌وقاچی دەجولێنێ ماڵ‌و سامان‌و دەستەلات بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی لەنێوئاوەکە هاتە دەرەوەو نوقم نەبوو دەگەڕێتەوە بۆکاروباری ئاین بەتایبەتی ئەگەر جل‌وبەرگی ساردوسەرمای لەسەردابوو.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی خەریکە نوقمدەبێ لەئاودا دوژمنەکەی خراپەی پێدەگەیەنێ.

*نوقمبوون لەئاوێکی سازگاردا نوقمبوونە لەماڵ‌و دارایيەکی زۆردا.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگە بینی نوقم بوە دەخرێتە ئاگری دۆزەخ بەپێی ئایەتی: ﴿ مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَارًا ﴾ (نوح: ٢٥) نوقمبوون فەرمانێکە خوداوەند رازی نییە پێی.

*ئەگەر نوقمبوو لەنێوجەگەری دەریادا دەستەلاتدار تورەدەبی لێی یاخود ئازاریدەدات‌و بەو ئازارەوە دەمرێ.

## خ و

**خواحافیزی (ماڵئاوایی):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی خواحافیزی لەژنەکەیدەکات تەلاقیدەدات.

*هەروەها دەڵێن: خواحافیزی بەڵگەیە لەسەر جیابوونەوە لەخواحافیزکار بەمردن یان بەهۆیەکیتری جیابوونەوە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+جیابوونەوەی دووشەریك.

+لابردنی دەستەڵاتدارو فەرمانڕەوا.

+زەرەری بارزگان.

*هەندێکدەڵێن: خواحـایزی باشـە لەلێکدانـەوەداو بەڵگەیـە لەسـەر گەڕانـەوەی تەلاقـدراوو ئاشـتبوونەوەی لەگـەڵ شـەریكو سـوودو قـازانجی بازرگـانو گەڕانـەوەی فـەرمانڕەواو چـاکبوونەوەی نـەخۆش چـونکە لەخواحافیزییـەوە هـاتوەو ماناکـانی وازلێهێنـانو پـشوو و دەستبەرداربوون هەڵدەگرێ.

(نابلـسی)دەڵێـت: بەڵگەیـە لەسـەر گەڕانەوە لەسەفەرداو بۆ نەخۆش باش نییە چونکە مەرگییەتی.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر لـەئامێزگرتنو خۆشەویستیو گریـانو لەیەکجیابوونەوە.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر چاکبوونەوەی نەخۆش.

**خـواردن ( خـۆراك ):** (ئـیبن سـیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی خواردنێکی گەرمی رەقی قوتدا بەڵگەیە لەسەر ناخۆشی ژیانو بژێوی.

*خـواردنی شـتی بـەتامو چێژ خۆشـی بژێویو ژیانە.

*ئەگەر بینی شتێکی نادیاری چەشتو رقی لەخواردنی بووەوە بەڵگەیە لەسەر مـردن بـەپێی ئایـەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾ (آل عمران : ١٨٥).

*خـــواردنی شـــتێکی بۆگـــەن پیاهەڵدانێکی ناقۆڵایە ، ئەگەر شتێکی نادیـار چـوە نێـوی بەتونـدی رقـی لەبـژێوی دەبێتـەوە، ئەگـەر شـتێکی باشو بەتامو چێژ چوە نێویو بـەتامو خۆشـبوو لەگەرووشـدا زوو دەڕۆیـی باشی بژێوییەو نایابی کاوررەفتارە.

*ئەگەر بینی لەدەمیدا خـواردنێکی زۆر هەیـەو هێـشتا زاری خـواردنی دی دەگـرێ کاروبارەکـانی تێکدەچـنو خەونەکـەی بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی لەتەمـەنی بەئەنـدازەی ئـەو خواردنـە بەسـەر چـوەو بەئەنـدازەی ئـەو بۆشـاییەی مـاوە لەزاریدایـە ، ئەگـەر بینـی چارەسـەری ئەوخواردنـەی کـرد هـەتا لێـی قوتـاربوو پارێزراودەبێـت، ئەگەر قوتارنەبوو لێی ئـەوە بائامـادەی مردن بێت.

*ئـەو خواردنـەی زۆرترشـە بەڕادەیـەك نـاتوانێ بیخـوات نەخۆشـی یـان ئـێشو ئازارە.

*وەرگرتنی خواردنی مزروترش بەڵگەیە لەسەر گوێبیستی وتەی خراپو ناقۆلا لەکەسێکەوە ، ئەگەر بینی خواردنەکە وەردەگری‌و دەرخواردی یەکێکی دی دەدات بخۆرەکەش هەمان قسەو وتە دەبیستێ، ئەگەر خواردی غەم‌و پەژارەو نەخۆشی توشدەبێ.

*ئەگەر بینی ئارامیگرت لەسەر خواردن‌و سوپاسی پەروەردگاریکرد دەرووی خێری لێدەکرێتەوە.

*ئەگەر بینی دەیمژێت خۆشنوودی دەروونیەتی، بوونی موو لەخواردندا غەم‌و پەژارەو ناڕەحەتییە.

*لێسانەوەی پەنجە بەدەستهێنانی خێرێکی کەمە لەجۆری ئەو خۆراکەی پەنجەی تیالێساوەتەوە.

*ئەگەر بینی خواردن دەخواتەوە وەك ئاو بژێوی فراواندەبێ.

*هەموو خواردنێك رزق‌و رۆزییە جگە لەهەریسەو هێلکە ئەمانە غەم‌و پەژارەن لەلایەن وەچەو نەوەوە پێدەگات.

(نابلسی) دەڵێت: هەموو خواردنێکی زەرد لەخەودا نەخۆشییە بۆ یەکێك کەبیخوات مەگەر گۆشتی باڵندەی تێدابێ.

*هەموو خواردنێك گۆشتی سپی تیابێت باشترە لەخواردنی ترش‌و مزر ئەگەر بەگۆشتی قەڵەوبوو هیچی تێدا نییە.

*ئەگەر خواردنی خواردەوە وەك ئاو بژێوی زیاددەکات، خواردنی شایی‌و ئاهەنگ مژدەیەو هی پرسەش غەم‌و پەژارەیە.

*ئەو خواردنانەی وابەستەی کاتێکی دیاریکراو نابن رزق‌و رۆزی‌و سوودێکی بەردەوامە، ئەو خواردنانەشی وابەستەی کاتێکی دیاریکراوە وەك گۆشت‌و باینجان‌و کوولەکەی سەنگەری رزق‌و رۆزییە لەکاتێکداو بەدەر لەکاتێکیتر.

*خواردنی پاشاکان شکۆمەندی‌و بەرزی‌و نوێکردنەوەی پلەوپایەیە بۆیەکێك لەگەڵیاندا بیخوات.

*خواردنی کوولەکە بەڵگەیە لەسەر رێنومایی‌و شوێنکەوتنی سوننەت‌و پاکێتییە.

*خواردنی زانایان زانیاری‌و رێنومایی‌و فەرپیتە.

*خواردنی پۆلیس‌و هاوپیشەکانی زیناو ئەنجامدانی کاری خراپەیە.

*خواردنی هەژارو دنیانەویستان تەوبەو رێنومایییە بۆ بخۆر.

*خواردنی گوندنشینان سەفەو گواستنەوەیە لەحاڵێکەوە بۆ حاڵێکیتر.
*ئەو چێشتەی گۆشتی تێدایە دەوڵەمەندییە بۆ هەژارو چێشتی بێگۆشتیش هەژاری یان بەندایەتییە، ئەگەر خواردنەکە گۆڕا بۆ باشتر بەڵگەیە لەسەر باشی ناخ و دەروون، ئەگەر گۆڕا بۆ تاڵی و ترشی بەڵگەیە لەسەر گۆڕانی هاوسەر یان کردارەکان.
*ئەگەر خۆی خواردنێکی لێناو خۆشبوو پلەوپایەیە بەئەندازەی خۆی بەدەستدەهێنێ و دەوڵەمەند دەبێت لەدوای هەژاری.
*ئەگەر کەسێکیتر چێشتی بۆ لێنا دەگونجێت فێڵی لێبکات و ترسی چاوبەستی هەیە، دەگونجێت پشتگیری لەسەر خوازو داواکەی وەربگرێ.
**خواردنەوە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خواردنەوەی خواردنەوەیەکی نادیاری بەتام و چێژ یاخود ئاوێکی سازگار بەڵگەیە لەسەر رێنومایی و زانیاری و تام و چێژ بۆ هەڵبژاردەکانی رێباز.
*ئەگەر ئاوی ساردی خواردەوە بەیانی زوو ماڵێکی حەڵاڵی دەستگیر دەبێت و خێو چاکەیە بۆ سەرجەم خەڵکی بەدەر لەوەی راهاتوە لەسەر خواردنەوەی ئاوی گەرم چونکە ئاو سروشتی نییە.

**خواردنی مرۆڤ:** (نابلسی) دەڵێت: خواردنی مرۆڤ لەخەودا قایلی و کەم خۆرییە مەگەر دەفرێکی حەرامی وەك مس و ئالتوون چونکە ماڵی حەرام و رۆچوونە لەقەرزاریدا.
*خواردن لەنێو خەڵکیدا هەواو ئارەزووە.
*جوینی ئەو پارووەی دەیخاتە دەمی تەمبەڵی و کارنەکردنە لەبۆ بژێوی و رزق و رۆزی.
*قووتدانی ئەوەی دەیجوێت ئاین و پەلەکردنە لەئەجەل و چارەنووسدا.
*ئەگەر تام و چێژی گۆڕی بەپارووەیەکی خۆش و باشتر بەڵگەیە لەسەر چاکی و ئاین ، ئەگەر گۆڕا بۆ تاڵی یان ترشی بەڵگەیە لەسەر گۆڕینی هاوسەرو کاروپیشە.
*ئەگەر بەدەستی راستی خواردی پابەندی سوننەتبووە.
*ئەگەر بەدەستی چەپی خواردی گوێڕایەڵی دوژمنەکەی کردووەو وازی لەهاورێکەی هێناوە.
*وەرگرتن و خواردن پاکداوێنی و پشتبەستن بەخودایە، دەگونجێت نەخۆش بکەوێت و نەتوانێت بەدەستی خۆی خواردن بخوات.

*ئەگەر لەرەنگێکی سووك‌و قێزەونی خوارد پلەوپایەی دادەبەزێت.
*خواردنی قارچکیش فەرمان‌و رێگر نییە یاخود مۆڵەت دانەو زیادبوونی ئەمانەو چارەسەریشە بۆ نەخۆش‌و بۆ رەبەنیش مارەبڕینی هاوسەرە، هەروەها زانست‌و رێنومایی‌و رزق‌و رۆزییەو پیشەو نەخۆشییە.
*خواردنی کولەکە بەڵگەیە لەسەر رێنومایی‌و شوێنکەوتنی سوننەت‌و داهاتنی فیتنەو ئاشووب.
*ئەوەی ببینێ کەسێك بانگیدەکات بۆ نانخواردن خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر سەفەرێکی دوور، ئەگەر بانیکرد بۆ نانخواردن لەنیوەڕۆدا لەماندبوون‌و هیلاکی پشوو دەدات.
*ئەگەر بانگیکرد بۆ نانخواردنی ئێوارە پیاوێك هەڵدەخەڵەتێنێ بەر لەوەی پیاوەکە فریووی بدات.
*ئەوەی ببینێ خواردنێکی خواردو هەرسبوو سوور دەبێت لەسەر بەردەوام بوون لەسەر پیشەکەی.
*ئەوەی ببینێ گۆشتی جەستەی خۆی دەخوات لەماڵ‌و گەنجینەی خۆی دەخوات ، ئەگەر هاتوو ماڵی کەسێکی تری خوارد ئەگەر کرچ‌و کاڵبوو غەیبەتیدەکات یان یەکێك لەخزمە نزیکەکانی ، ئەگەر گۆشتەکەش کوڵاوبوو یان سووروەکرابوو ماڵی کەسێکیتر دەخوات.

**خواستن:** (نابلسی) دەڵێت: هەرکەس لەخەودا ببینێ شتێکی خواستووە یان داویەتی بەیەکێك خێرێکی دەستگیر دەبێت بەلأم خێرەکەی بەردەوام نابێت، ئەگەر خراپ‌و نابەجێبوو بەردەوام نابێت ، ئەگەر خراپ‌و نابەجێبوو بەردەوام نابێت چونکە شتی خوازراو بەردەوام نابێت.

**خواستن‌و پێدان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی شتێکی خواست یا دای بەبەرانبەری بەئەمانەت ئەگەر ئەوشتە خۆشەویستبوو خێرێکی کورت بەدەستدەهێنێ، ئەگەر ناقۆڵابوو ناخۆشیەکی کورت رووی تێدەکات.
*هەروەها دەڵێن: ئەوەی ئاژەڵێك لەکەسێك بخوازێ ئەوەی پێیدەدا ئەرکی خوازەر هەڵدەگرێ.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی شتێکی بەنرخ‌و بەهاداری خواست بەڵگەیە لەسەر غەرامەیەك بەئەندازەی ئەوەی خواستوویەتی، هەروەها دەگونجێت بەئەندازەی نرخەکەی سوودمەند ببێت.
*دەگونجێت خوازراو بەڵگەبێت لەسەر ئابڕوچوون لەکارێکەوە پێویستە خۆی لێبپارێزێ.

**خوبەیرا**[1]: (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانیماڵو سامانو دارەکەشی پیاوێکی کۆترە.

*هەروەها دەڵێن: پیاوێکی هەژاری سوودمەندە.

**خودای مەزن**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: (ئەبوعەبدوڵلا)ی (تەستەری) بۆیگێڕاینەوەو وتی: لەخەودا بینیم وەك قیامەت بەرپابووبێت ئاوابوو، منیش لەگۆڕەکەم هاتمە دەرەوەو ئاژەڵێکیان بۆ هێنام سواری بووم، پاشان بەرزبوومەوە بۆ ئاسمان کەبەهەشتی تێدابوو ویستم دابەزم بەڵام پێیان وتم: ئەمە شوێنی تۆ نییە ..ئنجا بەرزیانکردمەوە بۆ ئاسمانو لەهەر ئاسمانێك بەهەشتێکی تێدابوو هەتا گەیشتم بەبالآترین بەهەشتو ئەوجا دابەزیمو ویستم دابنیشم وتیان: بۆچی دادەنیشیت بەر لەوەی پەروەردگارت ببینی، وتم: نەخێر ئنجا هەستامو بردیانمو، گەیشتمە لای پەروەردگارو لەبەردەمیدا (ئادەم) (عليه السلام) دانیشتبوو، کاتێ(ئادەم)م بینی لەلای راستی خۆیەوە داینیشاندم بەچەشنێکی کزۆڵو داماو، وتم: پەروەردگارا ...، ئەملاولای ئەم پیرەم گرتووە داواخوازم بمبەخشیت، گوێم لێبوو پەروەردگار دەیفەرموو: (ئادەم) هەستە لێت خۆش بووین.

*هەروەها (عەبدوڵلا)ی کوڕی (ئیبن حنیف) دەڵێت: خوشکەزای (بشر)ی کوڕی (حارس) بۆی گێڕامەوەو وتی: پیاوێك هات بۆ لای (بشر)و وتی: تۆی (بشر)ی کوڕی (حارس) ؟ وتم: بەڵێ، وتی: لەخەودا خوداوەندم بینیو پێی وتم: بچۆ بۆ لای (بشر)و پێی بڵێ: ئەگەر لەسەر پشکۆو ئاگر کڕنووشم بۆ بەرێت هەرگیز سوپاسگوزاری منی تەواو نەکردوە بەهۆی ئەو ناوبانگەی پێم بەخشیوە لەنێو خەڵکیدا.

*هەروەها (عوسمان)ی (ئەحوەل) کەقوتابی (خرازیان)بوە دەڵێت: (ئەبوسەعید) ئەو لای من مایەوە لەنیوە شەودا بانگیکردمو وتی: (عوسمان) هەستە خۆت ئامادەکە، منیش هەستامو بەئاگا هاتم، پاشان وتی: دەك لەناوچی، ئێستا لەخەودا بینیم وەك ئەوەی لەقیامەتدابمو شەیپوڕ لێدراو منیش هەستامە سەر پێو لەبەردەم پەروەردگارم راوەستێنرامو هەموو جەستەم کەوتە لەرزەو سەرجەم موەکانی جەستەم هەڵوەرینو مردن، ئەوجا پێی وتم: تۆی

[1] **غوبەیرا**: جۆرە بادەیەکە. (وەرگێڕ)

ئامـاژە دەکـەیت لەڕێگـەی (سـلمی)و (بثینـە)ەوە بـۆ ناسـینی مـن ، گـەر ڕاسـتگۆ نەبویتایـە سـزایەکی وەهـام دەدایت کەسـم لەجیهانـدا بـەو چەشنە سزا نەدابێت.

*(ئـەبو سـەعد) (خـوای لێڕازیبێـت) دەڵێـت: ئـەوەی لەخـەودا ببینـێ لەبـەردەم پەروەردگاریـدا ڕاوەستێنراوەو تەماشای دەکات، گەر خـەوبین پیـاو چـاك بێـت خەونەکـەی خەوی ڕەحمەتە، ئەگەر پیـاو چـاکیش نەبوو دەبێت بێدارو ئاگاداربێت چـونکە خوداوەنـد دەفـەرموێت: ﴿یَومَ یَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العَالَمِینَ﴾ (المطففین:٥٢).

*ئەگـەر بینـی خوداوەنـد لـەو دیـو پـەردەوە گفتوگـۆی لەگەڵـدەکات لەئاینـداران دەبێـتو ئەسـپەردەو ئەمانـەت دەسـپێرێت بەخاوەنەکـەیو هێزو دەستەڵاتی پتەو دەبێت.

*ئەگەر بینی بێپەردە لەگـەڵی دەدوێـن هەڵـەو ناتـەواوی لەئاینیـدا بـەپێی ئایەتی: ﴿وَما کان لبشر أن یُکلمه الله الا وحیا أو من وراء حجاب﴾ (الشوری: ٥١).

*ئەگـەر لـەدڵو دەروونیـدا مـەزنێکی بینـی وەك ئـەوەی پـەروەردگاربێتو نزیکیکـردەوەو ڕێـزی لێنـاو پێـی خۆشـبوو یـان لێپرسـیەوە یـاخود مژدەی پێداو سیفەتێکی دەستنیشان نـەکرد بەوچەشـنە دەگـات بەپەروەردگاری خۆی لەقیامەتدا.

*ئەگـەر بینـی بـەڵێنی لێخۆشـبوونی پێداوە وەك ئەوە وایە بەڵێنەکە ڕاست بێـتو هـیچ گومـانو دوودڵیـەکی لـەخۆ نەگرتبێت ، چونکە پەروەردگار هەرگیز بەڵێنـشکێن نییـە بـەڵام تووشـی نەهامەتیو دەردەسەری دەکات مـادام بەسەر زیندووە.

*ئەگـەر بینـی پـەروەردگار ئامۆژگـاری دەکـات کۆتـایی بەچەشـنێکدێت خوداوەند پێی ڕازی نییە بەپێی ئایەتی ﴿یعظکم لعلکم تذکرون﴾ (النحل:٩٠).

*ئەگـەر جـلو بەرگیکردەبـەر تووشـی خـەمو خەفـەتو نەخۆشـی دەبێـت بەدرێژایی تەمەنی ، ئەمـەش پێویستی بەسوپاسـگوزارییەکی بێـشومار هەیـە، دەگێڕنـەوە هەنـدێك کـەس لەخـەودا بینیویانە پەروەردگار دوو جلو بـەرگی لەبەر کردوەو سـەبارەت بـەم خـەوەش پرسـیار لـە (ئـیبن سـیرین) کـراوەو ئـەویش لەوەڵامـدا وتویـەتی: خـۆت ئامادەبکـە بـۆ نەهامـەتیو

نارەحەتیەکانی ئەوەندەش نابات خەوبینەر تووشی ئاوڵە دەبێتو بەو دەردەوە دەمێنێتەوە تا لەدنیا دەردەچێت.

*ئەگەر نوورو رووناکیەکی بینیو نەیتوانی وەسفی بکات هیچ شتێك سوودی لێوەرناگرێت بەدرێژایی تەمەنی.

*ئەگەر بینی پەروەردگار بەناوی خۆی بانگیدەکات یان بەناوێکی دی ناوبانگ دەردەکاتو زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا، ئەگەر پشکیّ لەخۆشیەکانی دنیای پێبەخشی بەلاَو نەهامەتیەکە شایستەی سۆزو بەزەیی خوایی دەبێت.

*ئەگەر بینی پەروەردگار خەشمو قینی هەستاوە لێی بەڵگەیە لەسەر توورەبوونی دایكو باوکی لێی.

*ئەگەر بینی دایكو باوکی لێی نارِزینو توورەن بەڵگەیە لەسەر خەشمو قینی پەروەردگار بەپێی ئایەتی: ﴿أن اشكر لي ولوالديك﴾(لقمان: ١٤).

*هەروەها دەگێرِنەوە: ((رەزامەندی خوداوەند لەرەزامەندی دایكو باوکدایەو خەشمو قینی وابەستەی خەشمو قینی ئەوانە))[1].

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی ببینیّ پەروەردگار خەشمو قینی لێیەتی ئەوا لەپلەوپایەیەکی بەرزەوە دەکەوێتە خوارەوە بەپێی ئایەتی: ﴿ومن يحلل عليه غضبي فقد هوى﴾(طه: ٨١).

*ئەوەی بینی لەسەر دیوارێك کەوتە خوارەوە یان لەئاسمانەوە یاخود لەشاخێکەوە بەڵگەیە لەسەر خەشمو قینی خودا لێی.

*ئەگەر خۆی لەبەردەم پەروەردگاردا بینیەوە لەشوێنێکدا کەشارەزاییبوو دادپەروەریو فەرِو پیت لەو شوێنەدا بڵاو دەبێتەوەو ستەمکاران لەناودەچنو مافخوراوو ستەم لێکراوان سەردەکەون.

*ئەگەر بینی وەك ئەوەی تەماشای کورسی پەروەردگار بکات نیعمەتو سۆزو بەزەیی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر پەیکەرو وێنەو بتێکی بینیو پێیان وت: ئەوە پەروەردگارتە ... یاخود خۆی وایزانی پەروەردگارەو پەرستشو کرنووشی بۆ برد رۆچوە لەناپەواو بەتاڵدا بەپێی ئەوەی خوداوەند حەقو راستیە ئەمەش

---

[1] (ترمذي) گێراویەتیەوە (١٩٠٠)و (ابن حبان) (٢٠٢٦) و (حاكم) (٤/١٥١ ، ١٥٢) لەفەرمودەی (عبدالله) ی کورِی (عمرو) (ئەلبانی) بە(صحيح)ی داناوە لە(صحيحه)ەکەیدا بەژمارە (٥١٦).

خەوی یەکێکە درۆ بکات بەدەمی خوداوە.

*ئەگەر بینی جنێو دەدات بەپەروەردگار یان ناسوپاسگوزارە ئەوا بێباوەڕە بەنیعمەتەکانی و ڕازی نییە بەچارەنووس و بەشی.

(نابلسی دەڵێت: پەروەردگار سەبارەت بەخۆی دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ العَلِيمُ﴾ (الشورى:١١). بینینی لەخەودا جیاوازە بەپێی نهێنی و پەنهانی هەرکەس، ئەوەی بەمەزنی ببینێ بێ چوان و نواندن بەڵگەیە لەسەر خێروچاکە و مژدەیە لەدنیادا بۆی و ئاینی پارێزراو دەبێت.

*ئەگەر بەپێچەوانەی ئەوەوە ببینێ خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر خراپی پەنهان و ژینی بەتایبەت ئەگەر خودا لەگەڵیدا نەدوێ.

*هەر نەخۆشێك پەروەردگار ببینێ دەمرێت چونکە پەروەردگار حەق و ڕاستییە.

*ئەگەر ستەم لێکراو ببینێ زاڵ و سەرکەوتوو دەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا ، بەڵام گوێگرتن لەقسەو گوفتارەکانی بێچواندن و نواندندن بەڵگەیە لەسەر بیدعەو داهێنانی خەوبینەر، دەگونجێت گوێبیستی قسەکانیشی ببێت بەڵگەبێت لەسەر هێمنی و ئارامی لەترس و بیم و گەیشتن بەهیوا و ئاوات.

*دەگونجێت گوفتار و وتەی بەڵگەبێت لەسەر بەرزبوونەوەی پلەوپایەی ئەگەر لەرێگەی پەیامەوەبێت ، ئەگەر لەپشت پەردەوەبوو دەگونجێت لەسەر بیدعەو وێڵکردن بێت ، هەروەها دەگونجێت پلەوپایەیەك بەدەستبهێنێت بەتایبەت ئەگەر نوێنەرێك هات بۆ لای.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی پەروەردگار ببینێت لەشێوازێکدا کەپیای هەڵبدات و باسی لێوە بکات خەوەکەی تێکەڵ و پێکەڵە چونکە خودا هەرگیز ناچوێنرێ و نانوێنرێ بەهیچ دروستکراوێکیتر.

*هەروەها دەڵێن: هەرکەسێك پەروەردگار ببینێ لەشوێن و جێگەیەکدا خەوبینەر درۆدەکات بەدەم خوداوە یان بۆچوون و رەفتاری ناشیاو دەداتە پاڵ خوداوەند.

*ئەوەی ببینێ پەروەردگار گوفتاری لەگەڵدەکات و دەتوانێت بۆی بڕوانێت خودا رەحمی پێدەکات و نازونیعمەتی دەڕژێ بەسەردا.

*ئەوەی ببینێ پەروەردگار شتێکی پێدەبەخشێ لەرۆژی قیامەتدا بۆیدەڕوانی.
*ئەوەی ببینێ لای ئەو نوێژ دەکات بۆی سۆزو بەزەیی و شەهیدبوون بەدەستدەهێنێت ئەگەر داوای بکات و بەهومێدی دنیاو قیامەتی دەگات.
*ئەوەی ببینێ باوەشی پێدا دەکات یان ماچی دەکات یاخود یەکێك لەئەندامەکانی ماچدەکات پاداشتی داواکراوی بەدەستدەهێنێت.
*ئەوەی ببینێ شتێکی پێدەدات لەخۆشیەکانی دنیا بەلاَو نەهامەتیان بەخۆشی رووی تێدەکات بەمەش پلەوپایەو پاداشتی گەورە دەبێت و بەباشە باسدەکرێت.
*ئەوەی ببینێ پەروەردگار بەلێنی لێخۆشبوونی پێدەدات یاخود چوونە بەهەشتی پێدەبەخشێ بەردەوام لەپەروەردگار دەترسێ و چاودێری دەکات.
*ئەوەی پەروەردگار ببینێ بەلاَم نەتوانێت بۆی بڕوانێ یاخود عەرشەکەی و کورسیەکەی خێرو چاکەی پێش خۆی خستووە.
*ئەوەی پەروەردگار ببینێ و گفتوگۆی لەگەڵ بکات یاخود بتوانێت بۆی بڕوانێت یان لەسەر عەرش و کورسیەکەی بەدیبکات خێرو زانیاری زیادەی بەدەستدەکەوێت.
*ئەوەی ببینێ هەڵدێت لەپەروەردگارو ئەویش داوای دەکات، ئەگەر خواپەرستبوو لەبەندایەتی و گوێڕایەڵی لادەدات، ئەگەر باوکی مابوو سەرپێچی و ئازاریدەدات، ئەگەر ژێر دەستەبوو قوتارو یاخی دەبێت.
*ئەوەی ببینێ لەنێوان خۆی و پەروەردگارا بەربەستێك هەیە گوناهی گەورە ئەنجامدەدات.
*ئەوەی بەرووگرژی و تورەییەوە ببینێ یان نەتوانێت نورو رووناکی پەی پێببات یان سەرسام بێت و رایچڵەکێنێ لەکاتی بینیندا یان داوای لێخۆشبوون و پاشگەزبوونەوەو تەوبە بکات بەڵگەیە لەسەر تاوان و گونەو بیدعەو هەواو ئارەزوو.
*ئەوەی ببینێ پەروەردگار گفتوگۆی لەگەڵدەکات قورئان زۆر دەخوێنێتەوە.
*ئەوەی ببینێ گفتوگۆی لەگەڵ دەکات و لەوتەکانی حاڵیدەبێت وتەو گوفتارێك لەدەستەلاَتدارو فەرمانڕەوایەك دەبینێ، خۆئەگەر لەوتەکانی حاڵینەبوو بەپێی ئەوە دەبێت.

*ئـەوەی ببینـێ پـەروەردگار دەسـت دەهێنێـت بەسـەریاو فـەڕو پـیرۆزی دەکـات بـەکاری لەرادەبـەدەرو نزیکـی تایبەتمەندی دەکـات ، هـەروەها بـەڵاو نەهامەتی لەسەر لانابات هەتا دەمرێت.

*ئەوەی پەروەردگار لەشێوەی بـاوكو برا یـان خـزمو خۆشەویستاندا ببینـێو بەسۆزو رەحم بێت بۆیو پیرۆزی بکـات بەڵایـەك روو لەجەسـتەی دەکـاتو بەمەش پلەوپایەی بەرز دەبێتەوە.

*ئـەوەی ببینـێ پـەروەردگار دێـت بـۆ شـوێنێك یـان ماڵێـك یـاخود زەویو شـارێك دادپـەروەری لـەو شـوێنەدا بڵاودەبێتـەوەو خێـرو بەرەکـەت بەفەرمانی خودا دەڕژێت بەسەریا.

*ئەگەر لەشوێنو جێگەیەك دەرکەوتو رووگرژبـوو تاریکـایی لەگەڵـدابوو ئـەوا وێرانەو خراپـە رودەکاتـە ئـەو شـوێنەو جێنـشینەکانی تیادەچـنو بـەڵاو نەخۆشیو نەهامەتی روویان تێدەکات.

*ئەوەی لـەکاتی بـەڵاو نەهامـەتی یـان لەلای زیندانیدا ببینـێ ئـازاد دەکریو خەمو پەژارەی لەسەر لا دەبرێ.

*ئـەوەی ببینـێ جنێـو بەپـەروەردگار دەدات سپڵەیە بەرانبـەر نیعمەتـەکانیو رازی نییە بەو بەشەی پێیداوە.

*ئـەوەی خـۆی ببینـێ لەبەردەسـتی خودایـا وەسـتاوەو تەماشـایدەکات ئەگـەر خەوبینـەر پیاوچـاکبوو خەوەکـەی سۆزو بـەزەییو رەحمەتـە، خۆئەگەر وانەبوو دەبێت وریا بێت.

*ئەگـەر بینـی نـزاو پاڕانـەوە دەکـات نزیکـدەبێت لێـیو لای خـەڵکی خۆشەویست دەبێت ، هـەروەها ئەگـەر بینی کڕنوشی بۆ دەبات بـەم چەشـنە دەبێت کەلێکمان دایەوە.

*ئەگەر بینی لەپشت پەردەوە دەدوێت لەگـەڵی ئـاینی باشـدەبێتو ئەمانـەت دەگەیـەنێتو هێـزو دەسـتەڵاتی پتـەو دەبێت.

*ئەگەر بینی بێپەردە لەگەڵی دەدوێت لەئاینـدا گونـاهی ئەنجامـداوە، ئەگـەر پۆشتەیکرد خەمو خەفەتو نەخۆشیەو بەدرێژایی تەمـەن نەخۆشدەبێتو بـەم پێیـەش پاداشـتی گـەورەی دەسـت دەکەوێت.

*ئەگـەر بینـی بـەناوی خـۆی یـان ناوێکیتر بانگیدەکات پلەوپایـەی بـەرز دەبێتـەوەو زاڵـدەبێت بەسـەر دوژمنەکانیدا.

*ئەگەر بینیی پەروەردگار لێی تووڕەیە بەڵگەیە لەسەر تووڕەبوونی باوكو دایك، هـەروەها تووڕەبـوونی دایـكو بـاوکیش

بەڵگەیە لەسەر تورەبوونی پەروەردگار.

*ئەوەی ببینێ خودا لێی توورەیە لەشوێنو جێگەیەکی بەرزەوە دەکەوێتە خوارەوە ئەگەر بینی لەسەر دیوار یان ئاسمان کەوتە خوارەوە پەروەردگار لێی تورە دەبێت.

*ئەوەی بت یان وێنەیەك ببینێو پێی بگوترێت: ئەوە پەروەردگارتە ئەویش بیپەرستێو کڕنووشی بۆ ببات رۆچوە لەناحەقیو بەتاڵداو بەرای خۆی وادەزانێت لەسەر حەقە.

*ئەوەی ببینێ خوداوەند بانگیدەکات ئەویش وەڵامی دەداتەوە (حەج)دەکات پشتبەخوا.

*دەگونجێت دەرکەوتنی لەشوێنو جێگەی دیاریکراو یان وێران بەڵگەبێت لەسەر ئاوەدان کردنەوەی، ئەگەر ئاوەدانبێت وێرانبوونە.

*ئەگەر دانیشتوانی ئەو شوێنە ستەمکارین خودا تۆڵەیان لێدەسێنێت، ئەگەر ستەم لێکراوبن دادپەوەریان بۆ فەراهەمدێت.

*دەگونجێت بینینی پەروەردگار لەشوێنێکی تایبەت بەڵگەبێت لەسەر موڵكو دەستەڵاتێکی مەزن، یان ستەمکارێکی بەدەستەڵات کاروباری بگرێتەدەست، یان لەوشوێنەدا زانایەکی شارەزاو بەتوانا هەڵبکەوێت یاخود دانایەکی خاوەن چارەسەر.

*ترسانیش لەپەروەردگار لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هێمنیو ئارامیو دەوڵەمەندی دوای هەژاریو رزقو رۆزی فراوان.

*ئەوەی ببینێ بوە بەحەق رێنوێنی دەکرێت بۆ رێبازی راستو رەوان.

*ئەوەی ببینێ پەروەردگار هەڕەشەی لێدەکات گوناهو تاوانێك ئەنجام دەدات.

**خورپە( لێکدان ):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر خورپەیەك هات بەسەریا لەخەوداو گریا بەڵگەیە لەسەر جیابوونەوە لەکوڕوماڵو منداڵ.

**خورما :** (ئیبن سیرین)دەڵێت: لە(عومەر)ەوە - رەزای خوای لێبێت - دەگێڕنەوە لەخەودا بینی وەك ئەوەی خورما بخوات ، خەوەکەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش فەرمووی: ((ئەوە تاموچێژو شیرینی باوەڕە)).

*جۆرەکانی خورماش زۆرە ، خورما بۆ ئەوەی دەیبینێ بەڵگەیە لەسەر بارانو ئەوەی دەیخوات رزقو رۆزی گشتییەو بەئایبەت بۆئەودێت.

*وتراویشە: خورما بەڵگەیە لەسەر خوێندنی قورئانی پیرۆز ، یاخود خورما

بەڵگەیە لەسەر ماڵودارایی پەسمەندەکراو.

*ئەگەر بینی خورمایەکی باشدەخوات قسەیەکی بەسوودی گوێ لێدەبێت.

*ئەگەر بینی خورما دەشارێتەوە ماڵو دارایی هەڵدەگرێت یان لەگەنجینە ماڵو دارایی بەدەستدەکەوێت.

*ئەگەر بینی خورما لەتدەکاتو ناوکەکەی لێدوور دەخاتەوە کوڕێکی دەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿إنَّ الله فالق الحب والنّوى﴾(الأنعام:٩٥).

*ئەگەر بینی خورما خواردن لەگەڵ قەتراندایە بەڵگەیە لەسەر تەلاقدانی ژن بەنهێنی.

*بلاوکردنەوەی خورما لەخەودا بوونی نیەتی سەفەرە، خورمای تیژ دەستکەوتە.

*ئەگەر بینی بەروبووم دەچنێتەوە لەدارخورمایەك لەکاتی خۆیدا ژنێکی پلەوپایەداری جوانی دەوڵەمەند دەهێنێتو ئەو ژنە پیرۆز دەبێت.

*هەروەها دەڵێن: ماڵو دارایی لەکۆمەڵو تاقمێکی ڕێزدارەوە بەدەستدەکەوێت بەبێ ماندوبوون یاخود زانیاریەکی بەسوودی دەستدەکەوێت، ئەگەر لەکاتو وادەی خۆیدا نەبوو گوێی لەزانیارییەك دەبێتو کاری پێدەکات.

*ئەگەر بینی خورمای ڕەش لێدەکاتەوە ژنەکەی کوڕێکی دەبێت لەبەندەیەکی ڕەش پێست.

*ئەگەر بینی خورمای تەڕ لەدارخورمایەکی وشکدەکاتەوە لەپیاوێکی خراپو نالەبار زانیاری فێردەبێت.

*ئەگەر خەوبینەر غەمو پەژارەداربوو دەرووی لێدەکرێتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿وهزي إليك بجزع النخلة﴾ (مريم:٢٥).

*هەروەها دەڵێن: خورمای پەرشو بڵاو درهەمو دینارێکە نامێنێتەوە، ئەگەر بینی خورما دەچنێتەوە ماڵو سامانێك بەدەستدەهێنێت لەپیاوی مەترسیدار.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم چڵ خورمام دۆزییەوە ، ئەویش وتی: چڵ دارت لێدەدرێت ، پاش ماوەیەك دییەوە وتی: چڵ دەنك خورمام لەبەردەرکی ماڵی فەرمانڕەوادا دۆزییەوە، پیاوەکە پێی وت: چڵ درهەمت دەست دەکەوێت. پیاوەکەش پرسی: ئەمجارە بەشێوەیەکی جیاواز خەوەکەت لێکدایەوە، ئەویش وتی: چونکە جاری یەکەم کەخەوەکەت بۆ گێڕامەوە دارودرەخت وشکبوبوو بەڵام ئەمجارە دارو درەخت ژیاوەتەوە بۆیە

هـەر جـارە بـەپێی کـاتی خـۆی لێکمداوەتەوە.

*پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)دەفـەرموێت: ((لەخـەودا بینـیم پیاوێـك هـاتو پارووێـەکی خورمـای بـۆ پێـچامەوە منـیش خـستمە دەمـم بـەڵام ناوکـە خورمـابوو تفمکـردەوە، دووجـاریتر بەهـەمان چەشنیکردەوەو منیش هـەر تفمکردەوە، (ئەبوبـەکر) (رەزای خـوای لێبێـت) دەفـەرموێت: "ئـەی پێغەمبـەر(ﷺ) بـا بـۆت لێکبدەمـەوە، حـەزرەتیش (ﷺ) دەفـەرموێت: بـۆم لێکبدەرەوە، (ئەبوبەکر) (رەزای خـوای لێبێـت) وتـی: کۆمـەڵێك دەنێرێـت بـۆ جیهـادو دەسـتکەوتیان دەبێـتو سـەلامەت دەبـنو دەدەن بەسـەر پیاوێکدا ئەویش خۆیدەخاتـە ئەستۆی تۆو ئەوانیش دەست بـەرداری دەبـن ، تاسێجار هەروادەبێت ، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: "وایە چونکە فریشتەکە بـەو چەشنەی لێکدایەوە".

*هـەروەها (ئەنـەس)ی کـوڕی (مالـك) لەخەودا بینی وەك ئەوەی (عەبدوڵلا)ی کوڕی (عومەر) - رەزای خـوای لێبێـت - خورما بخوات، ئنجا کـاتیَ بـەئاگا هـات بۆینووسـی: مـن تـۆم بینـی لەخـەودا خورما دەخۆیتو ئەوەش تامو خۆشـی باوەڕە.

*هـەروەها دەگێڕنـەوە: پیاوێـك خـۆی بەڕووتی دییـەوە وەك ئـەوەی سـەبەتە خورمـای نـابوو بەسـەریەوەو لـەورگی بـەرازدابوو، بـۆ خەولێکـدەرەوەی گێڕایەوە ئەویش وتی: ماڵی بێباوەڕانە، زۆری نـەبرد چـوون بـۆ جـەنگی (روم)و موسوڵمانان سـەرکەوتنو گەیشتن بـەو دەرەنجامە.

*خورمـاش مـاڵیکی حەلاڵـە بـەپێی زۆریو کـەمی، ئـەوەی لـەدارخورماو بـەروبومێکیتر لێبکاتـەوە سـەرقاڵی حەرامـدەبێت یـان سـەرقاڵی کاروبارێکدەبێت هیچی لێنابەستێتەوە.

*بـەروبووم لێکردنـەوە لـەدار بەڵگەیـە لەسـەر بەدەسـتهێنانی زانـست لەزانایـەك، لێکردنەوەشـی لـەدارێك دەنگ دابڕینو جەنگو بەربەرەکانیە.

*هـەروەها دەڵـێن: میـوە بـۆ هـەژار دەوڵەمەندییـەو بـۆ دەوڵەمەنـدیش زیادەیـە بـەپێی ئایـەتی: ﴿وفاكهة وأبا(٣١) متاعاً لكم ولأنعامكم﴾ (عـبس: **٣١_٣٢**).بـۆ کەسـێکی ترسنۆکیش ئەمنو ئاسایشە خوداوەنـد دەفـەرموێت: ﴿يدعون فيها بكل فاكهة آمنين﴾(الدخان:**٥٥**).

*هەروەها دەڵێن: میوەی تەڕ رزقێکە نامێنێتو دەفەوتێت، ئەگەر بینی میوەیەك پەرشو بڵاودەکرێتەوە بەسەریا بەچاکەو خێر ناوبانگ دەردەکات، ئەوەشی ببینێ بەروبوومی درەختێك لێدەکاتەوەو بەروبوومەکە هی خۆی نییە خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر زاوایەکی پیاوچاك یان هاوبەشێکی ساڵحو باش.

*ئەگەر لەزستاندا دارێکی بەروبوومداری بینی و بەباشیزانی پێویستی بەپیاوێکدەبێت وابزانێت خۆشگوزەرانە، ئەگەر هیچی لەبەروبوومەکەی نەچنیەوە بەهاوسەنگی پێی قوتار دەبێت، خۆئەگەر لێی بچنێتەوە بەئەندازەی چنینەوەی بۆ ماڵو خانەوادەی خەرجدەکات.

*لە(ئیبن سیرین) دەپرسن دەربارەی ژنێك دەنکە خورمایەك بمژێ بیدات بەدراوسێیەكو ئەویش بیمژێ، وتی: ئەو ژنە هاوبەشی خێروچاکە دەکات لەجلوبەرگ شتندا خۆی دەبینێتەوە.

*پیاوێکیش هات بۆلای (ئیبن سیرین) وتی: لەخەودا بینیم وەك ئەوەی جامێکم بەدەستەوەبێتو خورمای تێدابێتو سەری تێبکەمو لێی بخۆمو بڵێم ئای چەن ترشە، (ئیبن سیرین)وتی: تۆ پیاوێکی بەچەپو راست رۆچوویت لەپارەپەیداکردنداو گوێنادەیت بەوەی حەرام یان حەڵاڵ بێت بەلام من دەزانم حەرامە.

*ئەگەر ژنێك بینی خورما دەخوات لەگەڵ قەتراندا میراتی مێردەکەی بەتەلاقدان وەردەگرێت.

(نابلسی)دەڵێت: خورما بەرزقو رۆزی حەلاڵ راڤەدەکرێت، ئەگەر بینی خورمایەکی باش دەخوات گوێبیستی قسەو وتەی باشدەبێتو سوودو قازانجی دەستدەکەوێت.

*ئەگەر بینی خورما دەشارێتەوە ماڵو دارایی لەگەنجینە بەدەستدەکەوێت یان لەماڵو دارایا هەتیو یاخود ماڵو دارایی دەخاتە گەنجینەوەو کۆیدەکاتەوە.

*ئەوەی ببینێ دارخورمایەك دەبرێتەوەو لەوبارو حاڵەی تیایدایە لەدەستەلاتو سەفەرو کاری ئەستەمو گران دەرەوێتەوە.

*ئەوەی ناوك ببینێ دەبێت بەدارخورما کورێکی دەبێتو دەبێت بەزانا یان پیاوێکی سووكو نزم بەرز دەبێتەوە.

*هەندێکدەڵێن: خورما تەمەن درێژییە گەورەی (حمیر) پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینی وەك ئەوەی لەخاکێکی شۆرەکاتی پڕ لەدارخورما بێتو لەتەنیشتیدا زەوییەکی باشی بێ رووەك، ئنجا (ﷺ) فەرمووی: "ئاخۆ دەزانن ئەو زەوییە بۆ کێیە؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: هی (امرؤ القیس)ی کوڕی (حمیر)ەو ئەم دارخورمایە بگرەو لەوخاکەدا بینێژە ، ئەویش دەڵێت: فەرمانەکەم باش بەجێهێناو کاتێ بەئاگاتمو رۆژ بووەوە چووم بۆ لای (ئیبن سیرین)و هێشتا لاوبووم و خەوەکەم بۆ گێڕایەوە ئەویش بزەیەکی کردو وتی: تۆ وەك (امرؤ القیس) دەبیت بەشاعیر بەڵام تۆ لەبارەی پاكو پوختەکانەوە دەدوێتو باسی خورماش لەپێشوداکراوە.

(نابلسی) دەڵێت: خورما لەخەودا رزقو رۆزی یان نوێنەری خێروچاکەیە ، ئەوەی ببینێ خورما دەخوات ماڵێکی حەلاڵ بەدەستدەهێنێت .

**خورمافرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی خورمافرۆش بەڵگەیە لەسەر کاروکاسبی حەلاڵ یان زانایەکی پەیڕەوکاری سوننەت.

**خورمای پێگەیشتوو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: رزقێکی حەلاڵو چاکبوونەوەو خۆشیو شادییە.

*ئەگەر بینی خورمای پێگەیشتوو دەخوات لەکاتێکدا کاتی خۆی نییە چاکبوونەوەو فەرەوپیتی دەستگیردەبێت بەپێی چیرۆکی (مەریەم) ـ سەلامی خوای لێبێت ـ.

*هەروەها دەڵێن: خواردنی خورمای پێگەیشتوو کەلێکرابێتەوە گەشبوونی چاوو دیدە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: "ئەمشەو لەخەودا بینیم لەماڵی (ئەبی رافیع) بوومو خورمای پێگەیشتوویان بۆ هێناین لەلایەن کوڕێکی باشەوەو خواردمانو زانیمان کەبەرزیمان پێدەبەخشرێ لەدنیاداو دنیامان چاکدەبێ"[1].

(نابلسی) دەڵێت: خورمای پێگەیشتوو بەڵگەیە لەسەر مژدەدان بەکوڕو زیکرو یادو سەرکەوتن بەسەر دوژمنداو پاکێتی.

*هەروەها خورمای پێگەیشتوو رزقێکی حەلاڵو چارەسەرو دەروولێکردنەوەیە.

---

[1](مسلم) لە(رؤیا)دا(٨/٣٠٥)لەفەرموودەی ژمارە (٢٢٧٠) نووی و (ئەبوداود) (٥٠٢٥) لە(مسند)ەکەیدا (١٣١٥٢)لەفەرموودەی (ئەنەس)ەوە (رەزای خوای لێبێت ).

**خوری:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پۆشین و لەبەرکردنی خوری ماڵ و داراییەکی زۆرەو بەدەستیدەهێنێت ، خەوتن لەسەر خوری بەدەستهێنانی ماڵە لەلایەن ژنێکەوە، سووتاندنی خوری تێکچوونی ئاین و بەسەرچوونی ماڵەو پۆشینیشی بۆ زانایان دنیانەویستییە.

*ئەگەر سەگێکی بینی خوری پۆشیبوو دەگونجێت پیاوێکی سووك و رسوا بەماڵ و سامانی پیاوێکی رێزدار دەوڵەمەندبێت، ئەگەر شێرێکی بینی جلێکی خوری پۆشیبوو بەڵگەیە لەسەر دادپەروەری دەستەڵاتدارو حەقبێژی.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی پێستەی مەڕێکی پۆشیوەو خوری پێوەیەو لەژێروسەری هیچی پێوەنییە ماڵێك لەپیاوێکی رێزدار بەدەستدەهێنێ.

*خوری لەخەودا پاکێتییە مەگەر زبرو ناشیاوبێت لەگەڵ جل وبەرگەکەی ئەوجا هەژاری و ملکەچییە.

**خوری رێس:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی ستەمکاری زۆردارەو ستەمدەکات لەماڵ و سامانی خەڵکیدا، یاخود ماڵی هەتیو دەخوات.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر شانەفرۆش، دەگونجێت ئەو کەسەبێت کەپارە کۆدەکاتەوە ، هەروەها وتراوە پیاوێکە نارەحەتی لەسەر خەڵکی لادەبات.

**خوریفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر بەستنی پەیمان و رۆچوون لەکارێکی مەزندا.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر رستن یان ملکەچبوونی ژنان.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانج لەوەرزی زستاندا بەڵام لەوەرزی هاویندا بەڵگەیە لەسەر غەم و پەژارە.

**خوری و پێستەی حوشترو کەروێشك:** سوودو قازانج و رزق و رۆزی و جل وبەرگ و ماڵێکە بەمیراتی جێنەماوە یان ماڵێکی زەوتکراوە یاخود ماڵ و سامانی حەڵاڵە.

*ئەگەر بینی بەدەستیهێنا شکۆمەندی و ماڵێکی مەزن بەدەستدەهێنێت.

**خوڕەخوڕی سك و ورگ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا شەڕو ئاژاوەیە لەنێوان خزم و کەسوکاردا یاخود پێشبڕکێیە.

**خوڕەی ئاو:** (نابلسی) دەڵێت: سەرقاڵی و بەدبەختییە بۆئەوەی دەیبینێ.

**خولگە:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخولگەی یەکەمدایە یان خۆی

هەڵواسیوە هاوەڵایەتی فەرمانڕەوا یان وەزیرێکی درۆزندەکات.

*خولگـەی دووەم نووسـەری فەرمانڕەواو دەستەڵاتە.

*ئەگەر بینی لەخولگەی سێیەمدایە ژنێك یان چەن ژنێك دەهێنێ بەئومێدی خۆیدەکات.

*ئەگـەر خولگـەی چـواری بینـی هاوەڵایـەتی سـەرکردە یـان فەرمانڕەوایەکی مەزندەکات.

*ئەگـەر خولگـەی پێنجـەمی بینـی جـەنگاوەر یـاخود پیـاوێکی خوانـاس دەبینـێ یـان هاوەڵایـەتی پیـاوێکی خووسیفەت کامڵو تەواودەکات.

*ئەگـەر خولگـەی شەشـەمی بینـی زانیـاریو ڕێـز بەدەسـتدەهێنێتو سووردەبێت لەسەر کاروبارکان .

*ئەگـەر خولگـەی حەوتـەمی بینـی دەکات بەهاوەڵی فەرمانڕەوا.

*ئەگـەر خولگـەی هەشـتەمی بینـی تەماشای فەرمانڕەوایەکی مەزندەکاتو هاوەڵایەتیدەکات.

*ئەگـەر خولگـەی نۆیـەمی بینـی هاوەڵایەتی پیاوێکی ڕێزدار دەکات.

*ئەگـەر خولگـەی دەیـەمی بینـی کەخولگەی بەرینە فەرمانڕەوای باڵاو مەزن دەبینێ ئەگەر لەلانەی ئیسلامدا بێت.

*ئەگەر بینی لەخولگەدا دەسووڕێتەوە یـان یـەکێك لەخولگـەکانی بینـی پلەوپایـەی بەرزدەبێتـەوە دەگـات بـەهیوای خـۆیو شـکۆمەندی زیـاد دەکات.

*ئەگـەر خولگەیـەکی گـشتی بینـی لەخوداوەند نزیکدەبێتـەوەو پلەوپایـەو ناویـانگ بەدەسـتدەهێنێ یـان هاوەڵایـەتی مـەزنترین فـەرمانڕەوا دەکات.

*ئەگـەر بینـی خولگـەکان لەشـوێنی خۆیـەوە دەگـۆڕێ ، ئەگـەر دەسـتەڵاتداربوو سـتەمدەکات لەدەسـتەڵاتەکەیداو باروحاڵـەکان دەگۆڕێ.

*ئەگـەر ژنێـك بینـی لـەژێر خولکـەی ژێرەوەیـە شـوودەکات بەبەردەسـتی فەرمانڕەوا یـان ئەوانـەی پەیوەندییان پێوەی هەیە.

**خـولی مانگانـە ( حـەیز ، سـووڕی مانگانـە ):** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: ئەگـەر ئـافرەتێکی جـەحێلی لەخـەودا بینـی کەوتـە خـولی مانگانـەوە تەویـەدەکاتو خوداوەنـد دەرووی لێدەکاتـەوە، بـەڵام ئەگـەر لـەخوێن وەسـتابوەوەو خـەوی بینـی دیـسان خوێنی لێهاتبوو کـوڕە بـەپێی ئایـەتی: ﴿ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ ﴾ (هـود:٧١)، پێکـەنین لـەم ئایەتـەدا

بەمانای خولی مانگانە هاتوە، ئەگەر بینی کەوتوەتە حەیزەوە لەگوناهدایەو دەیەوێت لێی قوتار ببێت بەلام ناتوانێت.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر پیاو بینی لەخەودا کەوتوەتە حەیزەوە کارێکی حەرامو یاساغ ئەنجامدەدات.

*ئەگەر لەحەیزدابوو لەگوناهو تاواندایەو دەیەوێت لێی قوتار ببێت بەلام بۆی ناگونجێت چونکە ئەو حاڵە بوە بەبەشێك لەسروشتیو ناتوانێت دەستبەرداری ببێت مەگەر دوای هەوڵو تێکۆشانێکی زۆر نەبێت، ئەگەر تەوبەیکرد لەسەر تەوبەکەی جێگیر نابێ، پیاویش بەهەمان شێوەیە ئەگەر خەوێکی لەو چەشنەی بینی.

*هەر ژنێك بینی مێردەکەی لەکاتی خولی مانگانەدا دەچێتە لای خۆیو مێردەکەی لەو ولاتە کۆچدەکەن.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر پیاوێك بینی کەتووەتە خولی مانگانەوە درۆدەکات، ئەگەر ژنەکەی بینی کەوتوەتە خولی مانگانە کاروبارەکانی ئالۆز دەبنو دەروازەکانی لێدەبەستریٚ.

*هەروەها دەڵێن: خولی مانگانە کەڵەشاخ یان خوێن لێدەرهێنانە.

*هەروەها دەڵێن: شەیتانە ، ئەگەر شەیتانێك بەدیبکات خولی مانگانەی بەدیکردوە .

*خولی مانگانە خوێنێکی پەڵە پەڵاویەو رژاوە لێرەو لەویٚ.

*خولی مانگانە مووی پێشەو کاتێ پاکبوەوە موەکە لادەبات.

*خولی مانگانە کەمو کورییە لەئاینو رۆژوو نوێژدا.

*خولی مانگانە نەخۆشییە ، ئەو ژنە رەبەنەی ناهومێدبوە لەخولی مانگانە ئەگەر لەخەودا کەوتبوە ئەو حاڵەتەوە هاوسەردەگریٚ یان بەڵگەیە لەسەر خوێنبەربوون ، هەروەها میزی درێژکردن لەخەودا بەهەمان شێوەیە.

*دەگونجێت خولی مانگانەو خوێنی نەخۆشی بەڵگەبێت لەسەر بۆڵەو جیاوازی نێوان دووهاوسەر.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەزۆکی منداڵی نێرینە.

*خولی مانگانە بۆ ژنی دووگیان لەدایکبوونی منداڵی نێرینەیە.

*ئەگەر پیاوێك بینی کەوتوەتە خولی مانگانەوەو دەچێتە لای ژنێك بەداوێنپیسیو حەرامی.

*ئەگەربینی ژنەکەی کەوتوەتە خولی مانگانـەوە کاروکاسـبی سـاردی‌و بێبازاڕی رووی تێدەکات.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ژنێك بینی کەوتوەتە خولی مانگانەوە بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارەو نەخۆشی‌و تەلاق خولی مانگانەی تێدا بەمەرجگیراوە، مەگەر خولی مانگانەکە لەخەودا دوای مەرگ بێت بەڵگەیە لەسەر تەلاقدان یان مەرگی پیاو یا کوڕ یان دایك یاخود ئەوەی پرسەی بۆ دەگرێ‌و نازو نیعمەت‌و شتومەکی بۆ بەجێدەهێڵێ.

**خومی سوور:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵ‌و داراییە لەگەڵ نەخۆشیدا.

**خوێ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: سەبارەت بەخوێ جیاوازی هەیە، هەندێکیش دەڵێن: خوێی سپی دنیانەویستی‌و خێرو چاکەیە بەڵام (ئیبن سیرین) رقی لێبوو دەیگوت: "ئەو خوێیەی دەردەکەوێ غەم‌و پەژارەو سەرقاڵییە لەگەڵ نەخۆشی ، ئەوەی خوێ بخوات بەنانەوە قایلبوە بەدنیا بەشێکی کەم‌وکوڕ"خوێدانیش کچێکی شۆخ‌و شەنگ‌و جوانە.

*هەروەها دەڵێت: ئەوەی خوێ بدۆزێتەوە دەکەوێتەوە نارەحەتی‌و نەخۆشییەکی توندو سەختەوە.

(نابلسی)دەڵێت: خوێ لەخەودا ماڵ‌و سامانە بەبێ ماندوبوون پەیدا دەبێت، ئەگەر بینی خوێی خەڵکی خراپبوە نەخۆشی رشانەوە روویان تێدەکات یاخود نەبوونی‌و قات‌و قڕی لەوشوێنەدا بڵاودەبێتەوە.

*خوێ هەمووشتێکی پێ چاکدەکرێ وەك زانیاری‌و سوننەت‌و قورئان‌و ئیسلام‌و هاوسەرو ماڵ‌و سامان‌و کوڕو رزق‌و رۆزی حەلاڵ.

*ئەگەر خەوبینەر دەترساو خوێی بینی دڵنیایی وەردەگرێ یان دانایی چونکە واژووی خوێ داناییە.

*شتی سوێر بەڵگەیەلەسەر چارەسەری چاك‌و بەسوود لەنەخۆشی‌و پەتا، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر تەبایی‌و خۆشەویستی‌و کۆبوونەوە لەسەر خراپەوو خواردنی گوماناوی.

*ماسی سوێر هەواڵی خۆشەو سوێراوی زەیتون شکاندنی بەڵێن‌و پەیمانە.

**خوێفرۆش:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی ماڵ‌و ساماندار ، یاخود پیاوێکە چاکسازیدەکات لەنێوان خەڵکیدا.

**خوێن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خوێن ماڵ‌و دارایی حەرامە.

*ئەگەر بینی خۆی دەگەوزێنێ لەخوێندا لەماڵو سامانی حەرامدا رۆدەچێت یا لەگوناهو تاوانی گەورەدا.
*ئەگەر خوێنی بەکراسەکەیەوە بینیو نەیدەزانی لەکوێوە ئەو خوێنەی بەرکەوتوە درۆی لەگەڵدا دەکەن بەبێئەوەی بزانێت بەپێی چیرۆکی (یوسف) (سەلامی خوای لەسەر بێت).
*ئەگەر کراسەکەی خۆی بینی لەخوێندا گەوزاوە فەرمانڕەوای درۆزنو دەستبڕ درۆی لەگەڵدا دەکات.
*ئەگەر بەخوێنی بەرانێك خوێناویبوو پیاوێکی بەرێزو دەوڵەمەندو خاوەن دەستەڵات درۆ دەکات لەگەڵیا، خوێنی سەرجەم ئاژەڵانیش بەو چەشنەیە.
*ئەگەر بینی خوێنی مرۆڤی خواردوە ماڵودارایی‌و سوود بەدەستدەهێنێتو قوتار دەبێت لەهەموو فیتنەو بەڵاو ناڕەحەتییەك.
*ئەگەر خوێنی خەڵکی بخوات دەکەوێتە گوناهو پاشان قوتار دەبێت لێی.
*ئەگەر کەوتە نێو بیرێکی پڕ لەخوێنەوە بەخوێن یا خود ماڵی حەرام تاقیدەکرێتەوە.
*لەبەر رۆیشتنی خوێن تەندروستی باشو پارێزراوییە ئەگەر سەفەریکردبوو بەدروستی لەسەفەرەکەی دەگەڕێتەوە.
*پیاوێك دەڵێت: پیاوێکی مەزنو ناودارمان نوێژی خەوتنانی لەگەڵ کردینو تەندروستی باشو ساغبوو، بەلام بەیانی کەهاتەوە کوێربوبوو، ئێمەش هاتینە لایو پێمانگوت: چیت لێبەسەرهات بۆ ئاوات لێهات ؟ ئەویش وتی: لەخەودا هاتنە لامو بردیانم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش دانیشتبوو لەبەردەستیدا تەشتکی پڕ لەخوێن دانرابوو، لێی پرسیم: تۆ لەوانەیت کەوا کوشتاری (حسین)تان کرد؟ وتم: بەڵێ، ئنجا هەردوو پەنجەی گرتمو کردی بەنێو خوێنداو ئەوجا کردی بەهەردوو چاوماو پاشان کاتێ چاوم هەڵهێنا هیچم بەدینەکرد.
*پیاوێك هات بۆ لای (ئیبن سیرین)و وتی: لەخەودا تنۆکە خوێنێکم بەدەستمەوە دەبینیو هەرکات دەمشت پتر دەردەکەوت، ئەویش پێی وت: تۆ پیاوێکی نکوولی لەکوڕەکەت دەکەی بۆیە لەخوابترسەو نکوولی لێمەکە.
*(سوفیان) دەڵێت: لەخەودا بینم پۆشاکێکم لەبەردایە خوێناوییە، کاتێ رۆژ بووەوە هەستامو چووم بۆ مزگەوت

لەبەردەرگی مزگەوتدا خەولێکدەرەوەیەك هەبوو خەونەکەم بۆ گێڕایەوەو وتی: درۆ دەکەن لەگەڵتا بەو چەشنەبوو کەئەو وتی.

*خوێنی پیسو خراپ بەڵگەیە لەسەر بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لەسەرجەم خەڵکیدا، ئەگەر خوێنەکە کەمبوو بەڵگەیە لەسەر خانەوادەو خێزانو بەدەستهێنانی شەڕو خراپە ، ئنجا قوتار دەبێت لێی.

*هەروەها دەڵێن: لەخوێندا تەوبە هەیە لەگوناهو تاوان یاخود لەماڵی حەرامو بەجێهێنانی ئەمانەت کەلە ئەستۆیدایە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی خوێن لەلەشو لاری دێتە دەرەوە ، زامو برینەکانی لەشو لاری خۆی بینی لەشو لاری ساغدەبێتو ماڵو دارایی زیاد دەکات، ئەگەر لەسەفەردابوو دەگەڕێتەوە بەسەلامەتیو خێروچاکەی دەستگیردەبێت.

*ئەگەر دۆڵو شیوێکی پڕ لەخوێنی بینی لەشوێنو جێگەی خۆیدا خوێنی لەو شوێنو جێگەیەدا دەڕژێت.

*ئەگەر خوێنی بەجلوبەرگی خۆیەوە بینی درۆیەك دەکرێت لەگەڵیدا.

*ئەگەر خوێنێك ببینێ لێی دێتە دەرەوە بەبێ برینداری بەئەندازەی ئەو خوێنە لێدێتەدەرەوە ئەگەر ماڵو دارایی داربێت ، ئەگەر هەژاربێت بەهەمان شێوەی ئەو سوودمەند دەبێت.

*ئەگەر بکەوێتە نێو تەشتێ خوێن یاخود چاڵ یا گۆزەڵەیەکی خوێنی خوێنێکە رووبەرووی دەبێتەوە.

*ئەو خوێنەی لەمەرکانەو گۆزەیەکدایە ژنێکە لەسووڕی مانگانەدایە، ئەگەر سەری مەرکانەکە توندو بەسترابوو بەپەرۆیەك یاخود دەمەوانەیەك ئافرەت پەڕۆو سانتی بەخۆی هەڵدەگرێت.

*خوێن بەڵگەیە لەسەر ژیانو هێزو ماڵو دارایی، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی:

+یارمەتیدەداتو پشتگیریدەکات لەهەموو بەڵێندەرو فەرمانڕەوایەك یاخود هەموو پۆشاکێك ئەندامەکانی لاشە داپۆشێ.

+ئەو پیاهەڵدانو سەرزەنشتەی دەکرێت.

+ئەو ئاوەی لاواز دەبێت لەفڕێدانیدا.

+خواردنی حەرام بۆیەکێك حەرامخۆری بکات.

*ئەگەر لەخەودا خوێنێکی زۆری لێهات بەڵگەیە لەسەر کەمسوودی ئەو کەسەو دڵخۆشنەکردنی باوکی یا کوڕ یاخود شەریك یان ماڵەکەی کەمدەکات یان

جلو پۆشاکی خۆی دەفرۆشت یاخود لەهاوسەری خۆشەویستی جیادەبێتەوە.

*خوێنی مرۆڤ بەڵگەیە لەسەر شەیتانەی کەلە خوێندا دەگەڕێو دەسووڕێتەوەو، لەماڵەکەی خۆیدا وەك دوژمن وایە.

*دەگونجێت خوێن بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی لەسەرە مەرگدا بەسەر مرۆڤدا زاڵدەبێ.

*ئەگەر خوێنی خۆی خواردەوە بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو ماندوبوون یاخود قەرزێك بەقەرزێکیتر دەداتەوە.

*ڕۆچوون لەخوێندا بۆڵەبۆڵو غەمو پەژارەیە.

*بەربوونی خوێن لەکاتی پێویستدا پشوو ڕەواندنەوەی غەمو پەژارەیە.

*خوێنی مانگانەی ژنان بۆ کچ مێردەو بۆ ژنی دووگیانیش لەبارچوونی منداڵەو بۆ ژنی لەحەیز وەستاویش نەخۆشیە.

*ئەگەر بینی لەپاشیەوە خوێن دێت لەگوناهو تاوان قوتار دەبێت ، ئەگەر خوێناوییبوو پێی لەماڵو سامانی حەرام قوتار دەبێت.

*خوێنی مرۆڤ ڕۆچوونی خانەوادەیە لەماڵی خەوبینەردا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی لەپاشو دوادا.

**خوێن لێدەرهێنان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی خوێنی لێدەرهێنرا گوێڕایەڵی وتەیەکدەبێ.

*ئەگەر لەدەمارو ڕەگێك خوێن هاتەدەرەوە پاداشت دەدرێتەوە لەسەری، ئەگەر خوێنی لێدەرنەهات حەقێك دەربارەی دەوترێتو خوێنلێدەرهێنراو لەگوناهو تاوان بەدەردەکەوێ.

*ئەگەر بەباری درێژی خوێنی لێدەرهێنا قسەو وتەو زیاد دەکات یان کەمدەکات.

*ئەگەر بینی لاوێك خوێنی لێدەرهێنا لەباری پانیدا مردنی هەندێك لەخزمەکانیەتی.

*ئەگەر لاوێك لەباری درێژیدا خوێنی لێدەرهێنا بەلاو نەهامەتیەك ڕووی تێدەکات لەلایەن دەستەلاتدارەوەو بەئەندازەی ئەو خوێنەی لێیدەرهێنرا ماڵو سامانی لێوەردەگرێ.

*ئەگەر لەباری پانیدا خوێنی لێدەرهێنا دەستەلاتدار دەستدرێژی بۆناکات.

*ئەگەر زانایەك خوێنی لێدەرهێناو کردیە تەشتو یان قاپ

نەخۆشدەکەوێ‌و ماڵ‌و دارایی دەڕوات بۆ خانەوادەو پزیشکەکان چونکە قاپ‌و دەفر پزیشکە.
*ئەگەر ویستی خوێنی لێدەربهێنێ بەڵام خوێنی لێنەهات‌و لەش‌و لاری نەرووشا قسەو وتەیەك لەخزمەکانی دەبیستێ بەئەندازەی ئێش‌و ئازاری ئەوبەشەی لەش‌ولاری.
*ئەگەر بینی خوێنی لێدەربهێنێ‌و رقی لێبووەوە خوێنی لێدەربهێنن نەخۆشدەکەوێ‌و زەرەرو زیان بەماڵ‌و سامانیدەگات، ئەگەر لەناخیدا هەبوو خوێن لێگرتن سوودی لێوەردەگرێ‌و خوێنی بەئەندازەیەك لێهات ئاینەکەی دروست‌و لەشساغیشدەبێ لەوساڵەدا.
*خوێنگرتن لەلای راست زیادبوونی ماڵ‌و سامانەو لەچەپیشدا زیادبوونی هاوڕێیە، ئەگەر ژنی هەبوو زۆر قەڵەو دەبێ‌و دنیای گوشادو فراواندەبێ، ئەگەر ئارەقی سەری سڕی سەرکردەو بەرپرسێکی دی بۆ پەیدادەبێ.
*ئەگەر خوێنەکەی رەشبوو سوورە لەسەر تاوانی گەورە چونکە خوێن دەرچوونە لەگوناهو تەوبەکردنە.
*ئەگەر بینی نەشتەرێکی هێناو خوێنی ژنەکەی دەرهێنا لەباری درێژیدا کچی دەبێت، ئەگەر لەباری پانیدا خوێنی لێدەرهێنا پەیوەندی خزمایەتی دەبچڕێ ، ئەگەر بینی دەیەوێت خوێنی لێدەربهێنێ دەیەوێت تەوبە بکات.
(نابلسی) دەڵێت: خوێن لێدەرهێنان لەخەودا لەکەسێکی زانای شارەزا بەڵگەیە لەسەر پشوودان‌و چاکبوونەوە لەنەخۆشی‌و پێداویستی.
*ئەگەر خوێندەرهێنانەکە بۆ پێویستی نەبوو ئاگادارییە بەنەخۆشکەوتنی ئەندامێك.
**خوێندنەوە:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر قورئان یان ئایەتێکی لەخەودا خوێندەوە پلەوپایەو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت، ئەگەر سەرپێچیکاربوو خوداوەند لەسەرپێچی دووریدەخاتەوەو تەوبەدەکات، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت، ئەگەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە، ئەگەر شایەتیدانیدەدا بەحەق شایەتیدەدات یاخود ئەو ئەمانەتەی لەئەستۆیدایە دەیگەیەنێت.
*ئەگەر قورئانی بەدەنگێکی خۆش خوێندەوە پلەوپایەو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر قورئانی خوێندەوە بەناتەواوی پەیمانەکەی ناباتەسەر.

*ئەگەر نەیزانی چیدەخوێنێت گەواهی ناحەق دەدات یاخود سەردەکات بەبابەتێکدا نازانێت ئەگەر خەڵکی گوێیان لەقورئان خوێندنەکەی گرت کارێکی یاساغ پەسەند دەکات.

خوێندنی ئەو سوورەتانەی بەسەر مردوودا خوێندرێت بەزۆری بەڵگەیە لەسەر مردنی نەخۆشەکە.

*ئەگەر بینی قورئان لەرۆژی قیامەتدا دەخوێنێتەوەو بەباشی نایخوێنێتەوە لەکاتی بێداریدا بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی دوای هەژاریو زانینی سەرجەم پرسیارەکانو دڵنیابوون لەترسوبیم ، ئەمەش لەکاتێکدا ئایەتی خێری خوێند ئەگەر ئایەتەکانی شەڕی خوێند بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو ناوبانگو زیان.

*ئەگەر بینی لەدیوی دەرەوەی پەراوێکدا لەدنیادا خوێندیەوە ، میراتییەکی بۆ دەمێنێتەوە، ئەگەر پشتەکەی خوێندەوە قەرز لەسەری کۆدەبێتەوە.

*ئەگەر بینی کتێبێك دەخوێنێتەوە میراتیەکی بۆ دەمێنێتەوە، ئەگەر شارەزابوو لەخوێندنەوەکەیدا دەستەڵات بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی کتێبی خۆی دەخوێنێتەوە تەوبەدەکات بۆ لای پەروەردگار لەسەرجەم گوناهو تاوانەکانی.

*ئەگەر بینی کتێبی هەندێك لەعەجەمیەکانی خوێندەوە بەڕەوانیو رێكوپێکی بەڵگەیە لەسەرئەوەی روودەکاتە ولاتی عەجەمو ئەو شوێنانەی کەرانەهاتوە لەسەری، لەوێ کارێکی بەناوبانگ ئەنجامدەدات، ئەگەر لەخوێندنەوەی ئەوکتێبەدا خراپبوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی قوتاردەبێ لەولاتی عەجەم یاخود نەخۆشدەکەوێو پاشان چاکدەبێتەوە، ئەمەش بەهۆی جیاوازی وتەو گوفتاری عەجەم.

**خوێنەر:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە.

## خ ۆ

**خۆبەزلزانین:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی خۆی بەزلدەزانێ بەهۆی بەدەستهێنانی خۆشی دنیاو جێگیربوون لەسەرکاروبارەکانی بەڵگەیە لەسەر بەسەرچوونی تەمەنی بەپێی ئایەتی: ﴿ حَتَّىٰ إِذَا أَخَذَتِ

الأرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أهْلُهَا أنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَا أتَاهَا أمْرُنَا لَيْلاً أوْ نَهَاراً﴾ (يونس:٢٤).

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی خۆی بەگەورە دادەنێ بەهۆی بەدەستهێنانی خۆشیو نازو نیعمەتی دنیاو جێگیربوونی کاروبارەکانی بەڵگەیە لەسەر تەمەن بەسەرچوونی.

*خۆبەزلزانینیش لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزیو پلەوپایە بەڵام دەرەنجامەکەی بەشەڕو خراپە دەگات.

**خۆبەکەمزانینی مرۆڤ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: خۆبەکەمزانین لەبەرامبەر خەڵکیدا سەرکەوتنو شکۆمەندیو بەرزییە هەروەك هاتووە ((ئەوەی لەبەرخوا خۆی بەکەمدابنێ خوداوەند بەرزیدەکاتەوە))[1].

**خۆپەسەندی( لەخۆرازیبوون ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خۆپەسەندی لەلێکدانەوەدا ستەمو زۆردارییە ئەگەر بینی بەخۆی سەرسامبوو یان بەدەوڵەمەندیو هێزی ستەمدەکات.

(نابلسی) دەڵێت: هەموو لەخۆرازیییەك ستەمکارەو خۆپەسەندی لای مردوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی خوداوەند لەرۆژی قیامەتدا تەماشای ناکات ئەگەر حاڵو باری گۆڕابوو.

**خۆتەرخانکردن لە پێناوی خوادا:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خۆیەکلاییکردنەوە بۆ بەندایەتیو بەرنەدانی ئەوبارەو شوێنکەوتنی سوننەتو خواناسیو گوێڕایەڵی.

*ئەگەر بینی لەخۆتەرخانکردنو غەزا دێتە دەرەوە شوێنی چاکەو رێبازی چاکەکاران دەکەوێ.

*ئەگەر نەخۆش یاخود کەسێکی ئاوارەیبینی لەیەکێکیان دەگەڕێتەوە هەتا دەچێتە نێو شارێك بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی نەخۆشو گەڕانەوەی نادیارو غەریب.

**خۆچەورکردن:** (نابلسی)دەڵێت: خۆچەورکردن لەخەودا پیاهەڵدانو باسی باشەیە.

*خۆچەورکردن بەرۆنێکی بۆگەن پیاهەڵدانی خراپو ناقۆڵایە، بۆکەسانی ماندوو بەڵگەیە لەسەر پشودانو هێزو توانا زیادکردن.

**خۆخواردنەوەو بێزاری مرۆڤ:** لەخەودا ئەگەر بەکاربێت وەك خوو دابو نەریت

[1] (مسلم) لە(البروالصلة) (٨/ص٣٨٦) (٢٥٨٨/٦٩ نووی) لەفەرموودەیەکی (ئەبوهورەیرەوە) (رەزای خوایلێبێت).

بەڵگەیە لەسەر بەهادارکردنی بەرهەم‌و بابەتێکەلەبنەڕەتدا بازاڕی ساردە، یاخود نەخۆشیەکە یان سەرئاوەکەی دەشکێنێ‌و بەمەش دەحەوێتەوە، بەڵام ئەگەر خۆی خواردەوە بەهۆیەکی ناشیاو ئاگاداربوونیەتی لەخراپە، یان ماڵەکەی تالان‌و بڕۆ دەکرێت یا کون دەبێت یاخود مردوەکەی لەگۆڕەکەی دەردەهێنرێت‌و دەگوێزرێتەوە بۆ شوێن‌و جێگەیەکیتر یا زۆری لێدەکرێت زەکات بدات، یاخود ئەمانەت‌و ئەسپەردەی لێزەوت دەکرێت.

*ئەگەر دڵتەنگبوو و خۆی خواردەوە بەهۆی نەخۆشیەکەوە لەخۆیدا بەدی بکات دەگەڕێتەوە بۆ کارێك چاکە‌و باشەی ئاینەکەی تێدایە.

*ئەگەر دڵتەنگبوو خۆی خواردەوە بەبێ بیماری‌و نەخۆشی لەبەڵێن‌و پەیمانێك پاشگەز دەبێتەوە دابێتی بەمرۆڤێك یان نەزرێکی لەسەر خۆی بەپێویست گێڕابێت‌و بەجێی نەهێنابێت، یاخود وتەو ئامۆژگاریەکی کردبێت‌و لێی پەشیمان بووبێتەوە، دەگونجێت دڵتەنگی‌و خۆخواردنەوەشی بەهۆی تووڕەبوونێکی توندەوە بێت.

**خۆداپۆشینی مرۆڤ بەجل‌وبەرگ‌و شتیتر:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا چوست‌و چالاکی‌و رزق‌و رۆزییە هەروەها بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەیەکی باش وەریدەگرێت یان پێدەگات.

**خۆدانبەسەرا:** (ئیبن سیرین) دەڵێت:ئەوەی خۆی بجات بەسەر گۆچانێکدا ئەوا پشتی بەپیاوێك بەستوە لەکاروبارەکانیدا.

**خۆرئاوا( زەردەپەڕ):** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سوێند بەپێی ئایەتی : ﴿ فَلاَ أُقْسِمُ بِالشَّفَقِ﴾ (الإنشقاق : ١٦).

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەرکەوتنی جموجوول لەسەرۆك‌و پادشاو جێگیرەکانیەوە.

**خۆڕووتکردنەوەی مرۆڤ ( جلداکەندن ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی ببینێ خۆی رووتکردوەتەوە ئەگەر دوژمندار بێت زاڵدەبیت بەسەریاندا ، ئەگەر عەورەتی دیارنەبوو زاڵنابێت بەسەریاندا، ئەگەر عەورەتی بەشتێك یان دەستی داپۆشی ملکەچی دوژمنەکانی دەبێت‌و هەڵدێت لێیان.

*ئەگەر لەناوەڕاستدا مێزەری بەست تێکۆشەرە لەبەندایەتیدا.

*ئەگەر خۆی بینیەوە لێبڕاوە لەداوای شتێکدا بەئەندازەی لێبڕانی ئەو شتە بەدەستدەهێنێت.

*خۆڕووتکردنەوە ئەگەر سەرقاڵبوونی لەگەڵ نەبێت بەکارێك مەینەتو وازهێنانە لەگوێڕایەڵیو نهێنی درکاندنە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرین)دەڵێت: پیاوێکم بینی لەناوەڕاستی مزگەوتدا بەرووتو قووتی، شمشێرێکی گرتبوو بەدەستیەوە دەیکێشا بەبەردێکداو دەیکرد بەدووکەرتەوە ، (ئیبن سیرین)وتی: دەبێت ئەو پیاوە (حەسەن)ی (بەسری)بێت ، پیاوەکەش وتی: سوێندبێت بەخوا ئەوەی .(ئیبن سیرین)وتی: ئەوەی لێبڕاوە بۆ ئاین هەرئەوە، شمشێرەکەش زمانێتی.

(نابلسی)دەڵێت: ئەوەی خۆی لەجلوبەرگ دابماڵێتو خۆ داماڵینەکەشی لەچاکەدا نەبێت سەرپێچییە، ئەگەر ئەو شوێنەی خۆی لێ رووتکردەوە بازاڕبوو یان لەناوەڕاستی خەڵکیدابوو عەورەتی ئاشکراو دیاربوو، هەروەها شەرمی دەکرد لەحاڵی خۆیو هەندێك پۆشاکی پێوەمابوو نهێنی ئاشکرادەبێتو مەترسی نییە.

*ئەگەر خۆڕووتکردنەوەی بەوشێوەیە بێت کەباسکراو عەورەتی دیارو ئاشکرانەبوو قوتار دەبێت لەکارێکی خراپو ناپەسەند، ئەگەر نەخۆش بێت پەروەردگار شیفای دەدات.

*ئەگەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە، ئەگەر ترسابوو خوداوەند دڵنیایدەکات، ئەگەر هیچ جۆرە جلوبەرگێکی پێوەنەبوو نائومێد دەبێت لەپیاوێك ئومێدی پێیبوو، یاخود لەدەستەڵاتو فەرمانڕەوا دوور دەخرێتەوە یا ئەوکارەی پێوەی پابەندبوە کەمدەبێتەوە، سەرجەم ئەو حاڵانە ئەگەر عەورەتی دیارو بەرچاوبوو خۆی شەرمی لێدەکرد، ئەگەر عەورەتی بەدەر نەکەوت حاڵی روو بەچاکی دەچێتو لەگاڵتەو سووکایەتی دوژمن بەدەر دەبێت.

*هەروەها دەڵێن: رووتبوونەوە ستەمە، رووتکردنەوەی مردوو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هەواڵی خەوبینەر بەوەی هاوسەرەکەی تەڵاقدەدات یان ستەم رووی تێدەکات ، سەفەردەکات یاخود تەوبەو پەشیمان دەبێتەوە

لـەگوناهو تـاوان و ڕێنمـایی دەکرێـت بۆلای ئیسلام.

**خۆشاردنەوە:** (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: سـەبارەت بەخۆشـاردنەوە جیـاوازی هەیـە لەلێکدانەوەیـدا، هەندێکـدەڵێن: ئەگـەر بینـی خۆیدەشارێتەوە کـچێکی دەبێت بەهۆی ئایەتی : ﴿يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ﴾(النحـل:٥٩)، هەنـدێکیتر دەڵـێن: ئەگـەر بینـی لەماڵێکـدا خۆیدەشـارێتەوە هەڵـدێت بـەپێی ئایـەتی: ﴿إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا﴾ (الاحزاب:١٣).

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینـی چوەتە نێو ماڵێك پرسە دەگرێ ، خۆشاردنەوە لەخـەودا بەڵگەیەلەسـەر پـشتبەستن بـەوەی خـۆی لێدەشـارێتەوە، یـان ئـەوەی بەڵگەیـە لەسـەری، ئەگـەر بەپەتێك خۆیشاردەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پشتدەبەستێ بەدەستەڵاتدارێکی شـکۆمەند، ئەگـەر خـۆی شـاردەوەو پـشتیدا بەدارێکـەوە پـشتدەبەستێت بەزانایەك.

*ئەگـەر خەوبینـەر هاوسـەرەکەی دوگیانبوو مناڵێکی مێینەی دەبێت.

*دەگونجێـت خۆشـاردنەوە لەخـەودا بەڵگـەبێت لەسـەر دووڕوویـیو وتنـی قسەی خراپو بەد.

**خۆشـگوزەرانی:** (نابلـسی) دەڵێـت: خۆشگوزەرانی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر قوتـاربوون لەناڕەحـەتیو بەڵگەیـە لەسـەر قەرزدانـەوەو دەرووڵێکردنـەوەو ڕەواندنەوەی غەمو پەژارە.

**خۆشـۆردن:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: ئەگـەر بینـی خـۆی شـتو جلوبـەرگی نـوێی لەبـەرکرد ئەگـەر لابرابـوو لەدەسـتەڵات بۆیدەگەڕێتـەوە، ئەگـەر هـەژاربوو دەوڵەمەنـد دەبێـتو ئەگـەر زینـدانیبوو ئـازاد دەکـرێو ئەگـەر نەخۆشـبوو چـاکدەبێتەوەو ئەگـەر بازرگانبوو بازرگانیەکەی یان پیشەکەی سـاردیو بێبـازاڕی ڕووی تێـدەکات، پاشـان کاروبـاری جـێگیرو چەسـپاو دەبـێ، ئەگـەر خۆشـحاڵبوو (حـەج) دەکـات، ئەگـەر غـەمباربوو خوداوەنـد دەرووی لێدەکاتـــەوەو ئەگـــەر قەرزاریشبوو قەرزەکەی دەداتەوە.

*ئەگەر بینی خۆی شۆردو جلوبـەرگی دڕاوو کـۆنی لەبـەرکرد غـەمو پـەژارەی دەڕەوێتەوەو هەژار دەکەوێت.

*ئەگەر بینی خۆیدەشوات بەڵام تەواوی نەکرد کاروبارەکانی بەجێنایەت.
*ئەگەر بینی لەنێو کۆمەڵێکدا دەستنوێژ دەگریّو خۆیدەشوات لێیدراوە دەیدۆزێتەوە.
*شۆردنی دەست بەڵگەیە لەسەر بچراندنی هاوەڵایەتیو بەڵگەیە لەسەر نەمانی کێشەو گرفت.
*هەروەها دەڵێن: قوتاربوونە لەترسو بیم یاخود ناهومێدییە لەوەی ئاواتە خوازیەتی، یان تەوبەیە لەگوناهو تاوان.
(نابلسی) دەڵێت: خۆشۆردن لەخەودا بەئاوێکی پاك بەهۆی لەشگرانی یان خۆشۆردنی رۆژی هەینی بەڵگەیە لەسەر تەوبە لەگوناهو تاوانو گەڕانەوەی ئەرکی سەرشانو چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوكو هاوەڵان.
*ئەگەر لەزستاندا خۆی بشوات بەئاوی سارد دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو نەخۆشی، ئەگەر بەئاوی گەرم خۆی بشوات لەوەرزی زستاندا بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجو چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

*ئەگەر بۆ جەژن خۆی شت ئەگەر رەبەنبوو هاوسەر دەگریّ، ئەگەر بۆخۆرگیران خۆیشت دەگونجێت رووبکاتە کارێکی قورسوگرانە یان غەمو پەژارەیە بۆ ئەوەی خۆرومانگ بەڵگەیە لەسەری.
*هەروەها خۆشۆردنی نوێژە بارانەش بەوشێوەیەیە.
*خۆشۆردن لەشتنی مردو خۆداماڵینە لەتێکەڵبوون لەکەسانی بێئاگا.
*ئەگەر ئەو کەسەی خۆی شت بێباوەڕبوو موسوڵمانبوو یان شێتبوو چاکدەبێتەوە.
*ئەگەر بۆ ئیحرامبەستن خۆی شت یان بۆ چوونە نێو (مەککە) بەڵگەیە لەسەر دەرووی خێرو خۆشحاڵیو کۆبوونەوە لەگەڵ ئاوارەوکانو قەرزدانەوەو، هەروەها ئەگەر لەخەودا خۆیشت بۆ بەردەبارانی شەیتانو تەوافکردن.
*دەگونجێت خۆشۆردن دوای بەردەباران بەڵگەبێت لەسەر سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا، خۆشۆردن بۆ تەواف هەوڵدانە لەداواخوازی رزقو رۆزی یان خزمەتی گەورە پیاوان.
*ئەگەر ئەوکەسەی خۆیدەشوات (حەج)ی نەکردبوو (حەج)دەکات، ئەگەر هەژاربوو خوداوەند

دەوڵەمەندیدەکاتو ئەگەر بازرگانبوو بازرگانییەکەی قورسوگرانبوو خوداوەند چوستو چالاکی دەخاتەوە بازرگانیەکەیو تواناو دەستەلاتی مادی پێدەبەخشرێتەوە، ئەگەر دووخرابوەوە لەپۆستی دەستەلات بۆیدەگەڕێتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿ هَٰذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴾ (ص:٤٢)، چونکە (ئەیوب) ـ سەلامی خوای لێبێت ـ کاتێ خۆی شۆردو جلوبەرگی نوێی پۆشی خوداوەند خانەوادەو منداڵەکانیو ئەوەی لەدەستیدابوو بۆی گەڕاندەوە.

*ئەگەر بینی خۆشۆردنی لەشگرانی لەحەوزێك ئەنجامدا ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ.

*ئەگەر بینی بەئاوێکی گەرم خۆی شۆرد غەمو پەژرەی بەئەندازەی گەرمی ئاوەکە توشدەبێو خواردنەوەی ئاوی گەرمیش باش نییە لەلێکدانەوەداو خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ ﴾ (محمد: ١٥).

*هەروەها دەڵێن: خۆشۆردن هاوسەرگیرییە، ئەگەر ژنێکی نادیار خۆی بشوات باران لەئاسمان دەبارێ.

*ئەگەر مرۆڤێك دۆستایەتی هەبوولەگەڵ کەسێکدا یان شەڕو ئاژاوەو دەستی بەقەوزە شت بچڕانی حاڵو باری نێوانیانە.

*هەروەها دەڵێن: شتنی دەست بەسابوونو قەوزە قەرزدانەوەیە لەگەڵ رەواندنەوەی غەمو پەژارە.

*ئەگەر دەستی لەشتێك شت نائومێدبوە لێی.

*شتنی جلوبەرگ بەڵگەیە لەسەر چاکی ئاین.

*ئەگەر بینی جلێکی زەردی شتو پاکیکردەوە چاکبوونەوەیە لەنەخۆشی.

*هەروەها دەڵێن: شتنی جلوبەرگ بەڵگەیە لەسەر دانەوەی قەرز، هەروەها دەڵێن: سەرهەڵدانی شتی پەنهانو نهێنییە.

*شتنی مردوو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر قەرزدانەوە.

*ئەگەر مردوویەك خۆیشت دەرچوونی منداڵو جێنشینەکانیەتی لەغەمو پەژارەو چوون بەرەو خێرو زیادبوونی ماڵو سامانو وەچەیە ، ئەگەر مرۆڤێکیتر شتی پیاوێکی رەوشت خراپی بەد خود سەرهەڵدەداتو لەسەر دەستی ئەودا تەوبە دەکات.

*ئەگەر مردوویەکی بینی بەدوای مرۆڤێکدا دەگەڕا هەتا جلەکانی بشوات هەژارییەتی بەهۆی ئەو دوعایەی لێیکراوە یاخود قەرزدەداتەوە یان وەسیەتنامە بەجێدەهێنێ یاخود ستەم لەسەری لادەبات، ئەگەر شتی لەیەکبڕانی لەسەر دەستی ئەو دەبێ.

**خۆشەویستی**: (نابلسی)دەڵێت: خۆشەویستی لەخەودا غەمو پەژارەو کوێریو کەڕییە ، عەشقیش تاقیکردنەوەیە لەکاتی بێدارییو بەئاگاییداو باسوخواسو حاڵێکە شایستەی سۆزو بەزەیی خەڵکییە.

*بەڵگەیە لەسەر هەژاریو مردن بۆ نەخۆش، دەگونجێت مردن لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر عەشقو دووری لەخۆشەویستی، ژیان لەدوای مردنیش بەردەوامبوونی خۆشەویستی عاشقە بۆ یارەکەی ، هەروەها چوونە نێو ئاگر لەخەودا جیاوازیو سەرقاڵییەو خۆشەویستیش لەخەودا بێئاگاییو کەمو کوڕیە لەئایندا، عەشقیش تێکچوونی ئاینو کەمو کوڕی ماڵدارییە.

*خۆشەویستی لەبەرخوا لەخەودا جێگیربوونە لەئایندا دڵنیایی باشەو شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ).

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کوڕو هاوسەرو تەلاقدانو کەمو کوڕی ماڵو داراییو وشکی برایان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تیاچوونو برسێتیو نەخۆشی جیاواز جیاوازو سەفەر بۆ شوێنی دوورو مەترسیدار، ئەگەر بانگەشەی خۆشەویستیو ئالوودەبوونیکرد دوای رێنموونی وێڵو سەرگەردان دەبێت ، ئەگەر خەوبینەر زانابوو خەڵکی تووشی فیتنەو ئاشوبدەکات.

*ئەگەر خەوبینەر نابووتبوو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوەو ناوبانگدەردەکاتو بەڵگەکانی بەهێز دەبنو پتر دڵنیادەبێت لەئایندا.

*ئەگەر تازە موسوڵمانبوبوو بەرچاورۆشن دەبێت لەئایینداو باوەڕی پتەوو بەهێز دەبێت.

*ئەگەر زەفەری بەخۆشەویستەکەی هێنا لەخەوداو لەگەڵی جووتبوو خۆیو خۆشەویستەکەی دەکەونە بەر مەترسی سزاو تۆڵە ، ئەگەر لەگەڵ هاوسەرەکەی لەشوێنێکیتر جووتبوون دەگونجێت بەرهەمو دەرەنجامی هەبێت.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر بەرزی پلەوپایەو ئەقڵو ژیریو پڕو

تەماشاکردنی دەرەنجامی کاروکردار، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: "ئەوین و خۆشەویستی نیوەی ژیرییە"[1].

**خۆشەویستی مرۆڤ بۆیەکێك:**
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر ئەو خۆشەویستیە لەبەرخوابوو بەڵگەیە لەسەر رەحم و بەزەیی و رازیبوونی خوداو دەستهەڵگرتن لەگوناهو تاوان و رێنومایی بێباوەڕ بۆ لای ئیسلام ، ئەگەر لەبەر خوا نەبوو بەڵگەیە لەسەر گرێبەستی شەریکی و دەرەنجامەکەشی بەناپاکی یان بۆ ژن هاوسەرگیریە بێبەرپرس و گەورە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گریان ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەروولێکردنەوە.

*ئەگەر بینی دڵخۆشە غەم و پەژارە دایدەگرێ.

*ئەگەر بینی هاورێکانی لەخۆشیدان بەڵگەیە لەسەر رووداوێکی خۆش و پرچێژ.

**خۆشی وشادی:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بانگکردنی غەمبارو پەژارەدارە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+خێرایی تێگەیشتن و بوونی بیدادی لەلایەن گلێنەکار.

+خەرجکردنی ماڵ لەلایەن رژدو رەزیلەوە.

+هاتنی هەواڵی راست.

+چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

+هاندان بۆ سەرپێچی.

+خوارنەوەی مەی و ئارەق.

+زیناو داوێنپیسی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆشەویستی لەبەرخواو ئاراستەگیری روویەو.

**خۆکێشانەوە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: خۆکێشانەوە بێزاربوونە لەکاروبار یان تەمبەڵیە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەوەی پیاوێك ببینێ خۆی دەکێشێنێتەوە وەك یەکێك تێربووبێت ستەمکارێکی زیادەڕەوە لەکاروبارەکانیدا، ئەگەر ئەوەی خۆی کێشایەوە مردبوو لێکدانەوەی خەوەکە بۆ ئەوانەی جێگەی دەگرنەوە لەزیندوان دەبێت. خۆکێشانەوەش لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خۆبەزلزانین و شانازی و نەبوونی ئاین بەپێی ئایەتەکانی : ﴿فَلاَ صَدَّقَ وَلاَ صَلَّى ، وَلَكِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى ثُمَّ ذَهَبَ إِلَى أَهْلِهِ يَتَمَطَّى﴾(القيامة:٣٠ـ٣٣).

---

[1] (ئیبن سەعد) لە(الكامل للضعفاء) (٧٣/٣) هێناویەتی.

*دەگونجێت خۆکێشانەوەش لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر پشوودان دوای ماندوێتی، ئەگەرچی خەوبینەر نەخۆشبوو بورایەوە، ئەگەر تەندروستی تەوابوو نەخۆشدەکەوێت بەتایبەت ئەگەر لەگەڵ خۆکێشانەوەدا باوێشکیدا.

**خۆگرتنەوە لەشەڕو خراپە:** (نابلسی) دەڵێت: دەستگرتنەوە لەشەڕ بەڵگەیە لەسەر لەخۆسپاردن بەفەرمانەکانی خوداو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا.

**خۆڵ (خاك، قوڕ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خاكوخۆڵ بەڵگەیە لەسەر خەڵکی چونکە ئەوان لەخاكو خۆڵ دروستکراون.

*بەڵگەیە لەسەر:

+دنیاو ماڵودارایی.

+هەژاریو مردنو گۆڕ.

*ئەگەر بینی زەوی هەڵدەکەنێو خاكو خۆڵەکەی فڕێدەدات ئەگەر نەخۆشبوو یان نەخۆشی هەبوو گۆڕەکەیەتی دەریدەدات، ئەگەر سەفەریکرد ئەو چاڵ هەڵکەندنە سەفەرەکەیەتیو، خاكو خۆڵەکەشی ماڵو دارایيو سوودێتی، چونکە گەڕان بەزەویدا سەفەرە بەهۆی ئایەتی:﴿وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الأَرْضِ﴾(المزمل:٢٠).

*ئەگەر خوازیاری هاوسەرگیریبوو زەوی لەخەودا هاوسەرە هەڵکەندنیش رەقییە پاچیش عەورەتەو خاكو خۆڵیش ماڵودارایی ژنە یان خوێنی کچێنییە.

*ئەگەر راوچییەك زەوی هەڵکەند داوی تێدا بنێتەوەو خاكو خۆڵەکەی بژێوییەو ماڵێکە سوودی لێوەردەگرێ، وەگەرنا هەڵکەندی داوایەکە داوای دەکات لەگەڵ هەوڵو بژێوی یان فێڵو تەڵەکەیە.

*هەڵکەندنیش لەخەودا بریتییە لە: ئەوەی بۆ درندە هەڵدەکەنرێو چاڵەکە پێویستی بەفێڵو تەڵەکەبوو، پاشان دەستی یان جلوبەرگی بەهۆی تەپو تۆزو خاکەوە خۆڵاویبوو یان بەچنگ هەڵیگرت ئەگەر دەوڵەمەندبوو ماڵو دارایی تیادەچێتو ملکەچیو رسوایی رووی تێدەکات، ئەگەر قەرزاربوو یان ئەسپەردەی لادانرابوو دەیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکانیو هەموو لەدەستی دەردەچێتو دواتر پێویستیدەبێت، ئەگەر نەخۆشبوو بژێوی پەیداکردنی لەدنیادا کزولاواز دەبێتو ماڵو دارایی تیادەچێتو دەبێت بەخاكو خۆڵ.

*خاکپرژاندن بەزەویدا بەڵگەیە لەسەر کاروکاسبی، داگرتنەوەی زەویش

بەرۆیشتن بەسەریا یاخود گۆچان بەڵگەیە لەسەر سەفەرکردن لەخێردا.

* هەندێکدەڵێن: رۆیشتن بەنێو خاکو خۆڵدا دۆزینەوەی ماڵە ، ئەگەر دەستی بۆ بردو کۆیکردەوە یان خواردی ماڵو دارایی کۆدەکاتەوەو لەدەستی دەکەوێتەوە، ئەگەر زەوییەکە هی کەسێکیتربوو ماڵو داراییەکە هی کەسێکیترە.

* ئەگەر چنگێ خۆڵی هەڵگرت سوودو قازانجی بەو ئەندازەیە دەستگیر دەبێت کەهەڵیگرتووە، ئەگەر گسکی ماڵەکەیداو خاکو خۆڵی کۆکردەوە فێڵدەکات هەتا ماڵو سامان لەژنەکەی وەربگرێت، ئەگەر لەفرۆشگاکەیدا کۆیکردەوە لەبژێوی‌و کاسبی پارە کۆدەکاتەوە، چونکە خاکو خۆڵ ماڵو داراییە، ئەگەر بینی خۆڵی سەربانی ماڵەکەی گسکداو فرێیدا فەوتانی ماڵو دارایی ژنەکەیەتی.

* ئەگەر ئاسمان خاکو خۆڵی باراند چاکدەبێت ئەگەر زۆربوو ، ئەوەشی ماڵەکەی رووخاو تەپو تۆزو خۆڵەکەی بەرکەوت ماڵودارایی میراتی بۆ دەمێنێتەوە...

* ئەگەر خاکو خۆڵیکرد بەسەریا ماڵوسامانی بەلاوازی‌و بوودەڵەیی بەدەستدەکەوێت.

* ئەگەر بینی یەکێك خۆڵدەکاتە چاوییەوە ئەوەی خۆڵ دەکاتە چاوی ئەویترەوە ماڵوسامانی بۆ خەرج دەکات هەتا خوازو نیازێك یان داوایەکی بەجێبهێنێت.

* ئەگەر بینی ئاسمان خاکو خۆڵێکی زۆری باراندوە سزاو ئەشکەنجەیە، ئەگەر دوکانەکەی گسکداو خاکو خۆڵی لێهێنایە دەرەوە قوماشێکی لەگەڵدابوو لەجێگەیەکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ جێگەو شوێنێکیتر.

(نابلسی)دەڵێت: رۆیشتنی مرۆڤ بەنێو خاکو خۆڵدا دۆزینەوەو دەستکەوتنی ماڵو داراییە، ئەگەر خاکو خۆڵ بکرێ بەسەریا غەم‌و پەژارە رووی تێدەکات‌و ناکەرێتەوە بۆلای خودا تێدا ، خاکو خۆڵیش تەمەنی مرۆڤو ژیانیەتی.

* خاکو خۆڵ بەڵگەیە لەسەر رزق‌و رۆزی‌و کشتوکاڵو تێری‌و برسێتی.

* ئەگەر بینی لەسەر خاکو خۆڵێکی پاکو پیرۆز دانیشتوە بەڵگەیە لەسەر شادی‌و سەرکەوتنی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گومان لەئایندا یان بەڵگەبێت لەسەر ئەو خاکو گڵەی

خەوبینەری لێدروستبوە یا بۆی دەگەڕێتەوە.

*خاكو خۆڵ لەگەڵ ژندا لەخەودا بارێكی گوماناوییە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئاوو ئاگر یان با چونكە یەكێك لەرەگەزەكانە.

*بەڵگەیە لەسەر سەفەری قورس كەمرۆڤ تێیدا پێویست دەكات تەیەموم بكات.

*ئەگەر یەكێك خاكو خۆڵیكرد بەدەموچاویدا هۆنراوە بەسەر كەسانێكدا هەڵدەداتو ناهومێد دەبێت لێیان.

*دەگونجێت خاكو خۆڵ بەڵگەبێت لەسەر تیاچوون بەشێوەیەكی خراپ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو قەرزەی مەردومی قەرزار لەكەدار دەكات.

*خاكو خۆڵ بەڵگەیە لەسەر خێرایی بەدیهێنانی پێداویستیو پەیمان.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەی خێرە بۆئەوەی كاری پیسو سووك ئەنجامدەداتو بەڵگەیە لەسەر هەژارانو زۆربوونی ماڵو سامانیان.

*بۆ دەوڵەمەندانیش بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەو زۆربوونی ماڵو شتومەكیانو ڕێزلێگرتنیان.

**خۆڵەمێش:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خۆڵەمێش ماڵو دارایییەكی حەرامە، هەروەها دەڵێن: رزقو رۆزییە لەلایەن دەستەلاتدارەوە.

*ئەگەر خۆڵەمێشی بینی لەكاروباری دەستەلاتداردا ماندودەبێتو بەتەنیا هەر ماندوبوونی بۆ دەمێنێتەوە.

*هەروەها دەڵێن: زانیارییەكی بێسوودە.

*ئەگەر بینی تەنورێك پڕدەكات لەئاگر سوودو قازانج بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر فەرمانڕەوا كارێكی تێكەڵو پەنهانی هەبوو ئاشكراو ڕووندەبێتەوە، ئەگەر دوژمنداربوو زاڵدەبێت بەسەریا.

*خۆڵەمێش قسەو وتەی بەتاڵو بێكەڵكو سوودە، ئەوەی لەبەردەركی دەستەلاتدار ئاگر بكاتەوە هێزو تواناو دەستەلات بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر ئاگرێكی دیارو ئاشكرای بینی تیشكو ڕووناكییەكی زۆری هەبوو خەڵكی سوودو قازانجیان لێوەردەگرت پیاوێكی دەستەلاتداری بەرژەوەندی پەرستە.

*ئەگەر بینی لەگەڵ کۆمەڵێك لەدەوری ئاگرێـــك دانیـــشتوە دڵنیادەبێـــت لەخەوشەکانیو ئەوەش نیعمەتو فەڕو خێرە بەپێی ئایەتی: ﴿ أَنْ بُورِكَ مَنْ فِي النَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا ﴾ (النمل: ٨).

*ئەگەر ئـاگرێکی بینـی لـەماڵی خـۆی هاتـە دەرەوە دەسـتەڵاتو بازرگـانیو پیشە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر ئـاگرێکی بینـی بەسەرسـەریا هاتـەخوار یـان لـەنێو دەستیادەرچـوو ڕوونـاکیو پرشـنگێکی زۆریهــەبوو ژنەکـەی دووگیـانبوو کـوڕێکی دەبێتو ناوبانگێکی باشیدەبێت.

*ئەگەر مەشخەڵە ئاگرێکی بینی لەبەر دەرگاکەیو دوکەڵینـەبوو (حـەج)کات، ئەگـەر لەناوەڕاسـتی ماڵەکەیـدا بینـی لەوماڵەدا کشتوکاڵدەکات.

*ئەگـەر ئـاگرێکی بینـی لەشـەوێکی تاریکدا هێزو تواناو دەستەڵاتو شادیو نیعمـەتو دەسـتەڵاتی پێدەبەخـشرێ بەپێی چیرۆکەکەی (موسا) (سـەلامی خوای لێبێت).

*ئەگــەر لەتەنورەکەیــدا ئــاگرێکی هەڵگیرســاوی بینـــی ژنەکـــەی دووگیاندەبێت ئەگەر ئامادەبوو .

*ئەگـەر ئـاگرێکی بینی لەئاسمانـەوە دابەزیو سـووتاندی بـەڵام هیچکارێکی تێنەکرد سەرباز لەماڵی دادەبەزێ.

*ئەگـــەر ئـــاگرێکی بینـــی لـــەنێو پەنجـــەکانی دەرچـــوو نووســـەری فەرمانڕەوای ستەمکارە، ئەگەر لـەزاری بەدەرکـــەوت چـــاوداگرتنە، ئەگـــەر لەدەســـتی دەرچـــوو پیـــشەوەری ستەمکارە.

*ئەگەر بینی لەوێرانەو کاولەیەکدا ئاگر دەکاتـــەوەو خـــەڵکی بـــۆ بانگـــدەکات بانگیاندەکات بۆ وێڵیو بیدعەو ئـەوەی بەریدەکەویٚ وەلامیدەدەنەوە.

*ئەگـــەر بینـــی ماڵەکـــەی دەســـووتیٚ لەماڵەکەی بەو زوانە دێتەدەرەوە.

*پیاوێك هـات بـۆ لای (ئـیبن سـیرین)و وتی: لەخەودا بینـیم سۆلەکانم گرتبـوو بەســەر ئاگرێکــداو یــەکێکیان کەوتــە نێوئاگرو سووتاو ئەوی تریش رەشبوو. (ئـیبن سـیرین) لەراڤـەی خەوەکەیـدا دەڵـێ: تـۆ لـەخاکی (فـارس) ئاژەڵـت هەیەو تالانبرۆدەکریٚو نیوەی دەبریٚو ئـــەوەی کەماوەتـــەوە کـــەمێکی دەمێنێتەوە.

*ئەگــەر بینــی لــەنێو ئاگرێکدایــەو گەرمیو تینی نییە ڕاستگۆییو موڵكو ســەرکەوتن بەســـەر دوژمنەکانیـــدا دەهێنێـــت بـــەپێی چـــیرۆکی حـەزرەتی(ئـیبراهیم) (سـەلامی خـوای لێبێت).

*ئەگەر ئاگرێك یاخود گڕوبڵێسەیەك ببینێ دەكوژێتەوە لەنێو ئاژاوەو ئاشووبدا جێگیردەبێت.
*ئەگەر بینی ئاگرێك لەماڵی خۆیدا كەوتوەتەوە پرشنگو رووناكی لێدەبێتەوەو خانەوادەكەی سوودی لێوەردەگرن، بەرپرس و بژێوی پەیداكاری ماڵ دەمرێت ، ئەگەر لەولاتی خۆیبوو گەورەی ولات دەمرێ ، ئەگەر كوژایەوە لەباخەكەیدا مەرگی خۆیو منداڵەكانیەتی ، ئەگەر كوژایەوە لەماڵەكەیدا رەشەبایەك هەڵیكردو دیسان هەڵگیرسایەوە دزو جەردە روو لەماڵەكەی دەكەن.
*ئەگەر بینی ئاگر دەكاتەوەو لەكاتی بەئاگایشدا جەنگ لەئارادابوو ، ئەگەر كوژایەوە خەشمو قینەدەیگرێ، ئەگەر بازرگانبوو سوودو قازانجدەكات.
*دوكەڵ سزاو بەڵای خواییەو سزایەكە لەدەستەلاتدارەوە.
*ئەگەر دوكەڵی بینی لەفرۆشگاو دوكانەكەیەوە دێتە دەرەوە دەكەوێتە فەرو خێرو خۆشی دوای ئابڕوچوونو خراپە، ئەگەر دوكەڵ لەژێرمەنجەڵێكدابوو كەگۆشتی كوڵاوی تێدابوو فەرو خێرو دەروو رووی تێدەكات دوای بەڵاو نەهامەتی.

*ئەگەر بینی دوكەڵ سەری لێتێكدا لەرزوتا دایگرتو تینو گەرمای دوكەڵ لێیدا غەمو پەژارە رووی تێدەكات.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی خۆڵەمێش كۆدەكاتەوە یان بەدەستی دەهێنێت قسەوگوتەی پڕوپووچ هەڵدەگرێ یان زانیاریەكی هەیە هیچ سوودو قازانجێكی پێناگەیەنێت.
*خۆڵەمێش بەڵگەیە لەسەر:
+غەمو پەژارە.
+چاوئێشە یان گلكردنی.
+وێڵیو سەگەردانی دوای رێنومایی.
+كوژاندنەوەی ئاشوبو فیتنەو شەڕ.
+دڵنیایی لەترسو بیم.
*خۆڵەمێشی فڕنەكان بەڵگەیەلەسەر خێرو قسەی زیادەو بێكەڵك.
**خۆمەلاسدان:** (نابلسی) دەڵێت: خۆمەلاسدان لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تێكۆشانو غەزا لەپێناوی خوداوەندا.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:
+خۆ خەریككردن بەهاوسەرو نوێژەوە.
+برسێتیو پارچە پارچەبوون.
+شكانی ئارەزووی نەفسو حەزەكانی.
*دەگونجێت خەڵوەتكێشیو برسێتی بەڵگەبێت لەسەر برسێتیو حاڵ وەستان.

*چلەکێشی بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەو بەدەستهێنانی پەیمانو بەڵێن.

**خۆهاویشتنە نێوکارێک:** دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مەرگ.

## خ ە

**خەتەنە:** ئەگەر بینی خەتەنە دەکرێ خێرێکە دێتە رێی‌و خوداوەند لەگوناهو تاوان پاکیدەکاتەوەو بەباشی هەڵدەستێت بەفەرمانی پەروەردگار.

*ئەگەر بینی پارچە گۆشتە زیادەکەی بڕی زیادبوونیماڵو داراییەو ساردو سڕییە لەئایندا ئەمجۆرە خەونەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی خاوەنەکەی دەستبەرداری ئاینەکەی دەبێت لەپێناوی دنیادا.

*ئەگەر بینی خەتەنەکراو خوێنی زۆر لێهات لەگوناهو تاوانەکانی پاکدەبێتەوەو روودەکاتە بەجێهێنانی سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

(نابلسی)دەڵێت: خەتەنەکردن بەڵگەیە لەسەر پاکبوونەوە لەپیسی‌و خۆشی‌و شادییە ، ئەگەر پیاوێك خەتەنەکرا خوێنی لەبەر دەڕوات، بۆکچیش شوودەکات، دەگونجێت بکەوێتە خولی مانگانەوە، هەروەها خەتەنەکردن هێنانەوەی هاوسەرە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەرزکردنەوەی یادو زیکرو چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

*دەگونجێت خەتەنەکردن بەڵگەبێت لەسەر جیابوونەوە لەهاوسەر یان جیابوونەوە لەکوڕ یا دایكو باوك بۆیەکێك موسوڵمان نەبێت.

**خەتەنەکار:** بینینی بەڵگەیە لەسەر دەرخستنی عەورەتو ئاگاداربوون لەشوورەیی‌و ئابڕوچوون ، بینینی خەتەنەکاری ژنان بەڵگەیە لەسەر دەرخستنی نهێنی ژنانو بینینی کەموکوڕی‌و عەورەتیانو دەست لێدانی عەورەتی ژنان.

**خەدیجەی کچی خوەیلد (رەزای خوای لێبێت):** ئەم هاوسەرەی پێغەمبەر (ﷺ) هەرکەس لەخەودا بەدیبکات خۆشحاڵی‌و وەچەی چاکیدەبێت.

**خەرجی(مووچە):** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر فراوانی‌و پاراستنی منداڵو جێ پڕکردنەوەی ماڵو منداڵ بەپێی ئایەتی: ﴿وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ (سبأ: ٣٩).

*ئەگەر بینی بەزۆر ماڵی خەرجدەكات ئەجەلی نزیكدەبێتەوە.
*دەگونجێت خەرجیو فراوانی بەڵگەبێت لەسەر دووڕوویی.
**خەردەل:** خەردەل ژەهرە ئەوەی بیخوات ژاری دەرخوارد دەدرێت یان شتێكی تاڵ.
*وتراویشە ماڵێكی پاكو بێگەردی دەستدەكەوێت بەماندوبوونو هیلاكی.
**خەرمانەی رۆژو مانگ:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی خەرمانە لەدەوری رۆژدا لەخەودا دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رێبازی تاوانبارانو دەورەدانیان.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاتنی فەرمانڕەوایان لەوڵاتێكداو كۆبوونەوەیان تێیدا.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەلاو نەهامەتیو خەشم لێگرتن.
**خەزنەدار:** (نابلسی)دەڵێت: خەزنەدار بەرپرسی ئاگرە ، ئەگەر لەخەودا بینی دەكەوێتە بەردەستی پۆلیس، ئەگەر بینی بزەو خەندە لەسەر لێوەكانیەتی قوتاردەبێ لەزیندان، ئەگەر نەخۆشێك خەوێكی لەو جۆرەی دی ترسی مردنی هەیە.
*بینینی بۆ یەكێك سیفەتی گۆڕابێ بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی خواو پێغەمبەرو باوەڕدارانو شكۆمەندی بۆ دەسەتەلاتدارو دووركەوتنەوە لەدووڕوویيو پاشگەزبوونەوە لەگوناهو تاوانو رێنومایی دوای سەرگەردانیو بوونی غیرەت لەبۆ ئاین.
*ئەگەر بینی رووی تێكردو هات بەرەوپیری بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی پاراستنی لەئاگر.
*ئەگەر پشتی تێكردو رووی لێوەرگێڕا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەوتوەتە نێوكارێكەوە شایستەی سووتانو ئاگری دۆزەخە.
*ئەگەر بەبزەو خەندەوە بینی دەم بەپێكەنین دەبێ بۆ پۆلیسێ سەربەدەستەلاتدارە.
**خەزەم (درەختێكە پەتی لێدروست دەكرێت):** بەڵگەیە لەسەر ستەمو بێئاگایی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چوڵكردنەوەی ئەوەی سوودی ئەوی تێدایە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزی یاخود تووڕەبوون لەدوژمن.
**خەساندن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی بینی خەسێنراوە یان خۆی هەڵدەستێت بەخەساندنی خۆی ملكەچیو سەرشۆڕی رووی تێدەكات، ئەگەر ویستی ئەمانەتێك لای پیاوێك دابنێ یان نهێنیەكی لاباس بكات بەلام

لەخەویدا خەسێنراوێك بینی با ئاگاداربێت ئەمانەتەکەی لا دانەنێ.

* ئەگەر خەسێنراوێکی نادیاری بینیو رووخسارو شێوەی ساڵحی پێوەدیاربوو لەگەڵ داناییدا فریشتەو پەرییەکە ئاگاداریو مژدە دەبەخشێ.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر خەسێنراو ناسرابوو وەك خۆیەتی، ئەگەر بینی خەسێنراوە رێنومایی خوایی بەدەستدەهێنێت لەبەندایەتیو یادو زیکری خوا.

* ئەگەر بینی خۆی خەسێنراوە پلەوپایەیەکی بەندایەتی وەردەگرێت لەگەڵ داوێنپاکی.

* خەسێنراوی سپی فریشتەی سۆزو بەزەییەو هی رەشیش فریشتەی سزاو خەشمە.

* خەسێنراو بەڵگەیە لەسە رەواندنەوەی نعیمەتو لەدەستدانی خزمو کەس‌وکارو کوڕ.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زۆر لەخۆنەکردنو زاڵکردنی پشوو خراپی پەنهانو نهێنی.

**خەشخاش( رووەکێکی بێهۆشکەرە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵێکی باش‌و سوودمەندە بۆ یەکێك بیخوات.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی تۆوی خەشخاش ئاڵای هەڵدراوی شەکاوەیە.

**خەشم‌و قین:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی خەشم‌و قینی هەیە بەرانبەر مرۆڤێك کاروبارەکانی تێکدەچن‌و ماڵ‌و دارایی دەڕوات بەپێی ئایەتی: ﴿ وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْرًا ﴾ (الأحزاب:٢٥).

* ئەگەر تورەبوو لەمرۆڤێك لەپێناوی دنیادا پیاوێکەسووکایەتی بەئاینی خودادەکات، ئەگەر لەپێناوی خودایا تورەبوو هێزو دەسەلات بەدەستدەهێنێ بەپێی ئایەتی: ﴿ وَلَمَّا سَكَتَ عَنْ مُوسَى الْغَضَبُ ﴾ (الأعراف: ١٥٤).

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر مردن لەناکاو ئەگەر هۆکاری نەبوو ، دەگونجێت خەشم‌و قین لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر ئابڕوچوون‌و نەخۆشی بەهۆی گۆڕانی حاڵی خەشم‌وقیناوی لەکاتی خەشم‌و قیندا.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیاهەڵدانی باش‌و خێری چاك بۆ خاوەنەکەی‌و خەڵکیتر ، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ

والعَـافِينَ عَـنِ النَّـاسِ وَاللهُ يُحِـبُ المُحْسِنِينَ﴾ (ال عمران: ١٣٤).

**خەڵات (دیاری):** (ئیبن سیرین)دەڵێـت: دیـاریو خـەڵات دەستنیـشانکردنە، ئەگەربینی دیارییەکی بۆ نێردرا یاخود خۆی دیاری نارد بۆ کەسێك کیژەکـەی یـان کەسـێکی نزیکـی دەستنیـشان دەکریۆ مـارە دەبـڕێ بـەپێی ئایـەتی: ﴿وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِمْ بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ ﴾ (النمل : ٣٥). (بـەلقیس)دیـاری نـاردو (سـولەیمان) (سـەلامی خـوای لێبێـت) دەستانیشانیکرد.

*هـەروەها دەڵـێن: دیـاریو خـەڵاتی خۆشەویست بەڵگەیـە لەسـەر رووداني ناتەواویی لەنێوان خەڵاتکارو خەڵاتکراو پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێ: "خـەڵاتو دیـاری بـۆ یـەکتربنێرن خۆشەویـست دەبن"[1].

(نابلـسی)دەڵێـت: لەخـەودا خۆشـیو شـادییە بـەپێی ئایـەتی: ﴿بَلْ أَنْتُمْ بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴾ (النمل: ٣٦).

[1](بوخاری) لە (الأدب المفرد) (٥٩٤) و (بیهقي) (١٦٩/٦) و (ئەلبـانی) لـە (الإرواء) (١٦٠١) لەفەرموودەیـەکی (ئـەبوهورەیرە)ەوە (سـند)ی خۆی هێناویەتی.

**خەڵووز:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خـەڵوز لەداردروسـتدەکرێو پیـاوێکی مەترسیدارە یان ماڵێکی حەرامە.

*هـەروەها دەڵـێن: رزقێکـە لەلایـەن دەستەڵاتدارەوە دێت.

*خەڵوزێك سوودی لێوەرنـەگیرێ وەك خۆڵەمێش وایە بەتاڵو پووچە، ئەگـەر خەڵوزێکی بەسوودبوو توێشووی پیاوە لەکارێکدا.

*(سیـف)ی کـوڕی (ذي یـزن) لەخـەودا ئـاگرێکی لەئاسمانـەوە بینـی دابـەزی بۆسەر (عەدەن)و هەر پشکۆیەك کـەوت بەسـەر ماڵێکـداو کوژایـەوەو بـوو بەخـەڵوز، خەوەکـەی بـۆ راڤـەکارێکی خـەو گێڕایـەوەو ئـەویش وتـی: (حەبەشە) دەسـتدەگرێ بەسـەر وڵاتـی تۆداو لێکدانەوەکەش بەو شێوازەبوو.

(نابلـسی) دەڵێـت: پـشکۆی گـەورە بـۆ یـەکێك پێویـستی بەوردەکـەی ببێـت بەڵگەیـە لەسـەر غـەمو پـەژارەو ماندوبوونو حاڵو بار ئەستەموگران.

*خـەڵوزی بـچووك بۆیـەکێك پێویـستی بەگەورەکـەی هـەبێت تیـابردنی مـاڵو سامانە.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر ژیانەوەی ئاگری بڵێسەدار.

*خەڵوز لەزستاندا بەماڵو سامان لێکدەدرێتەوە.

**خەڵوزفرۆش:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خەڵوزفرۆش دەستەلاتدارێکی ستەمکارەو ژێردەستەکانی هەژار دەخات چونکە دار لەلێکدانەوەدا پیاوەو ئاگریش دەستەلاتدارە.

*ئەگەر خەڵوزی بینی باشنەبوو کۆمەڵو نەتەوەیە کەهەژارکەوتوون بەهۆی دەستەلاتدارەوەو ماڵو سامانیان بۆ دەگەڕێنێتەوە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر شەڕو فیتنەو ڕووڕەشیو درۆ.

**خەڵوەتگە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر دەستەلاتدارو فەرمانڕەوایەك ناوبانگی بەزانیاریو بەندایەتی دەرکردبێ.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر لانەو ماڵو شوێنو سوودو قازانجی ئەوەی دەدرێتەپاڵی، ئەوەشی لەهەوادابێت بەڵگەیە لەسەر گۆڕی ڕێزدارو دەروونی شەهیدان بەپێی ڕەنگو ناواخنو کرۆکی، ئەولانەیەشی ڕەنگی ڕەش بێت یان پڕ لەبەرازبێت دێرو کەنیسەیە لەلێکدانەوەدا.

(نابلسی) دەڵێت: خەڵوەتگە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+شوێنێك بەتەنیا مەردوم خۆی تێدابێ.

+ناوبانگی باش.

+تەنیایی.

+گۆشەگیریو خودابڕان لەژێرو ئارەزوو.

+جیابوونەوە لەهاوسەر.

+وازهێنان لەبراو هاوەڵان.

*دەگونجێت بینینی خەڵوەتگە بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشیو وازهێنان لەئارەزووی خواردنو خواردنەوە، ئەگەر خەوبینەر نەخۆشبوو دەمرێتو چێژو لەزەتی کۆتایی پێدێت.

*ئەوەی بڕیارو فەرمانی بەسەر خەڵوەتگەیەکدا بڕوات یا دروستیبکات لەخەودا پلەوپایەی بەرزو بڵند بەدەستدەهێنێت.

*خەڵوەتگە بۆیەکێك ببینێ لەخەودا خۆشیەکی تازەو نوێیە ژنە یاخود قەلایەکە بەتایبەت ئەگەر سەرکردەو فەرمانڕەوایەك بینیو خوازیاری بەرەبەرکانی دوژمنبوو، هەروەها دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەزینو شکستهێنانی ئەو سەرکردەیە.

*خەڵوەتگە بەڵگەیە لەسەر:

+غەریبیو بیرکردنو غەم.

+بچڕاندنی پەیوەندی نێوان هاوەڵان.
+شاردنەوەو پەینهانیکردن.
**خەمو پەژارە:** ئەگەر بینی غەمو پەژارەدارە خۆشیو شادی رووی تێدەکات.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: غەمو پەژارە بەڵگەیە لەسەر خۆشیو شادی، هەروەها شاریش غەمو پەژارەیە بەپێی ئایەتی: ﴿لَا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ﴾ (القصص : ٧٦).
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر هاوڕێکانی لەتەنگو چەڵەمەدا بینی بەڵگەیە لەسەر تەنگو چەڵەمەو پەراژەخواردن.
*غەمو پەژارە بەڵگەیە لەسەر نەخۆشیو غەمو پەژارە بەهۆی خانەوادەکەیەوە یان کارخستنە ئەستۆی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پوچەڵکردنەوەی سوودو قازانجو جموجووڵ.
*ئەگەر شتێك لەوانەی لەحاڵی بێداریدا هەبوو بەڵگەیە لەسەر خێرو بەپێچەوانەشەوە.
**خەنجەر:** ئەگەر بینی خەنجەری بەدەستەوە گرتوە ماڵو سامانو دەوڵەمەندی بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر خەنجەر یان چەقۆیکردەوە بەنێو کالاندا ژنێك مارە دەبڕێت.
**خەندەق(کەندر):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خەندەق بەڵگەیە لەسەرئەوەی پادشایەك یا وڵاتێك خۆی لێدەپارێزێت بەهۆی پاسەوان یان سەربازەوە یا ئەوەی دوژمنی پێ دووردەخاتەوە.
*ئەگەر خەندەق بەڵگەبێت لەسەر پادشا سەربازو پیاوو ماڵو دارایی دەبێت، ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر دنیاو جیهان بەڵگەیە لەسەر زانایانی دنیاو ئەوانەی پارێزگاریدەکەن لێی.
ئەگەر خەندەق بەڵگەبێت لەسەر ژن خەندەق بەڕێوەبەریەتی.
*ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر کوڕ ئەوە خەندەق باوكو دایکیەتی.
*ئەگەر خەندەقێکی بینی یا شارێکی بێ خەندەقی بینی بەڵگەیە لەسەر حەلاڵبوونی کاروبارەکان وەك نەدانی زەکاتو ماڵتیابردنو تیاچوونی زانیاریو هێرشی دوژمن یاخود فەرمان بەخراپەو ڕێگری لەچاکە.
**خەنە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: خەنە توێشوو پێداویستی پیاوە بۆئەوکارەی ئەنجامیدەدات.
(نابلسی)دەڵێت: خەنە جوانکارییە لەماڵو منالدا.

**خەنەفرۆش:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بۆیەچی، خاوەنی داوو دەرمانی بەسوود ، بینینی بەڵگەیە لەسەر شادیی و مژدەو سۆزوبەزەیی.

**خەو:** (نابلسی)دەڵێت: خەو بۆکەسێك شایستەبێت بەڵگەیە لەسەر بەرزبوونەوەی پلەوپایەو ئەو ئاستەی پێیگەیشتوە ، بۆیەکێکیش شایستەی نەبێت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گوناهو تاوانی خەڵکیدەخاتە ئەستۆی خۆیو لەسەر نەخۆشیەکی توندو سەخت.

**خەوگە( جێی نوستن،راخەر):**

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کچو ئاژەڵو پلەوپایە، ئەگەر تەختەبوو بەڵگەیە لەسەر باشە، ئەگەر لەقوماشبوو بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندیو مەزنیو خێرو چاکەو باشبوونی باری گوزەرانو جلوبەرگی نوێو برایەتیو تەباییو کۆبوونەوە.

*راخەری قوماش بەڵگەیە لەسەر مژدەو خۆشی دوای چەند رۆژێك پێیدەگات.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی لەسەر جێگەیەکە شتێکی بۆ دەگەڕێتەوە کەلەدەستیدەرچووبێت، ئەگەر دەستەڵاتداربوو دەستەڵاتەکەی لاواز دەبێ ، پاشان بەهێز دەبێتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴾ (ص: ٣٤).

*ئەگەر خوازیاری هاوسەرگیریبوو ژنێك مارە دەبڕێ.

*ئەگەر لەسەر جێگەیەکبوو پێخەفی بەسەردا درابوو بەرزیو بڵندییە بەسەر کۆمەڵێ دووڕوودا، ئەگەر پێخەفی بەسەرەوە نەبوو سەفەر دەکات.

*هەندێکدەڵێن: جێگەو هەموو ئەوەی لەسەری دەنوون بەڵگەیە لەسەر ژنو سەرجەم رزقو رۆزیو بژێوی.

(قەیرەوانی) دەڵێت: جێگە بەڵگەیە لەسەرئەوەی مەردوم شارو دڵخۆشو رێزداردەبێت بەهۆیەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی مرۆڤ دەچێتەسەری لەکەشتیو هاوسەر.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دارەمەیت چونکە جێگەی چارەنووسە، ئەوەی جێگەکەی بشکێ لەخەودا یاخود لەبەریەك هەڵبوەشێ دەستەڵاتو توانای بەسەردەچێتو ئەگەر دەستەڵاتداربێ لەکاردەخرێو لەژنەکەی جیادەبێتەوە ئەگەر

نارێکیشبێت لەگەڵی بەنەخۆشیو دەمرێت یان ژنەکەی دەمرێت ئەگەر نەخۆشبێت یا سەفەردەکاتو بەجێیدەهێڵێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مێردو دواکەشی بەڵگەبێت لەسەر ژن ئەوەشی لەدوای سەروویەوە دێت بەڵگەبێت لەسەر کورو ئەملاولاکەشی بەڵگەبێت لەسەر خزمەتکارو کچ.

*ئەگەر خۆی لەسەر جێگەیەك بینیەوە بەلام نادیارو نەناسراوبوو لایو شایستەی دەستەلاتبوو بەدەستی دەهێنێت، وەگەرنا لەپلەوپایەیەکی بەرزو مەزندا دادەنیشێ ، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ ، ئەگەر دووگیانبوو کوڕێکی دەبێت.

*ئەگەر پێخەفو سەرچەفی بەسەرەوەنەبوو ئەوەی بەسەریەوەیەتی سەفەرێکی دوور ئەنجامدەدات، ئەگەر نەخۆشبێ دەمرێ، ئەگەر ئەو خەونە لەرۆژانی (حەج)دابوو سواری کەشتیەکدەبێت یان لەسەر جێگەو پێخەفێك خۆی دەبینێتەوە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر جێگەوخەوگەیەك ببینێ لەماڵی دەستەلاتدارێکداو پێخەفی لەسەر راخرابێت پاشان پاڵبکەوێت لەسەری دەستەلاتو پلەوپایەیە بەدەستی دەهێنێت، ئەگەر نەعلی لەپێدابوو لەگەڵ کۆمەڵێ کەسی دووروودا سەفەردەکات.

*ئەگەر خۆی دییەوە لەسەر خەوگەیەکی خۆشو چاك دەستەلاتو پلەوپایەو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر خۆی لەسەر جێگەیەك دییەوەو ژنێکی لەگەڵدابوو لەخۆشیو پشووداندا لەگەڵیدەبێت ، دەگونجێت شەڕو ئاژاوەو لەیەکجیابوونەوە بکەوێتە نێوانیان.

*ئەگەر ژنێکی بێ مێردی بینی لەسەر جێگەیەك هەڵدەگیرێ بۆ ماڵی خۆی هاوسەردەگرێ.

*ئەگەر بینی جێگەکەی بۆ دادەنرێو نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی لەنەخۆشی.

**خەیار:** خەیارو ترۆزی غەمو پەژارەیە، ئەوەی بیخوات لەکاروبارێکی قورسوگراندا هەوڵدەدات، بەتایبەت گەر زەرەربوو.

*خەیار لەکاتی خۆیدا رزقو رۆزییە، ئەگەر لەکاتی خۆیدا نەبوو نەخۆشییە.

*ئەگەر بینی دەیخوات و هاوسەرەکەشی دووگیانبوو کچیدەبێت.
*هەندێکدەڵێن: ئەگەر خەیار بەئاسن لەتکرا بۆ نەخۆش باشە.
*هەروەها دەڵێن: خەیار بەڵگەیە لەسەر دووگیانی ژنی خەوبینەر.
*هەورەها دەڵێن: خراپە وەك پاقلەو نیسك.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا رزق و رۆزییەکی خراپە نامێنێتەوە، ترۆزی و خەیار رزق و رۆزی باشە.

## خ ێ

**خێرارۆیشتن (لۆقەلۆفکردن):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خێرا رۆیشتن لەهەر شوێنێکدا بێت زەفەر بردنە بەدوژمن و ئاسایی رۆیشتن بەرێوە خۆبەکەمزانینە لەبەر خودا، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ﴾ (لقمان: ١٩).
*رۆچوون بەنێو زەویدا ئەگەر بەبێ هەڵکەندنبوو قووڵیشبوو وایدەزانی دەمرێ و دەرنایەتەوە ئەنجامدانی کاری مەترسیدارەو لەخشتەبردنە لەپێناوی دنیادا یان مردنە.
(نابلسی)دەڵێت: خێرا رۆیشتن بەڵگەیە لەسەر خێرایی بەجێهێشتنی دنیا یاخود بەسەرچوونی پلەوپایە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر (حەج).

**خێرایی و پەلەکردن:** (نابلسی) دەڵێت: خێرایی و پەلەکردنی مرۆڤ لەخەودا نیشانەو بەڵگەی هێواشی جموجوڵە، مەگەر ئەوەی خێراو پەلە دەکات نەخۆش بێت لەوکاتەدا بەڵگەیە لەسەر مەرگ و نەمانی.
*دەگونجێت نیشانەو بەڵگەبێت لەسەر کرداری چاکەو دەستپێشخەری بۆی، ئەمەش لەکاتێکدا ئەگەر خێراو پەلەکردنەکەی بۆ خێربوو، ئەگەر بۆ شەربوو بەڵگەیە لەسەر پاشگەزبوونەوە لەئیسلام یاخود هەڵسان بەکردارێك کەدواتر پەشیمان دەبێتەوە لێی.

**خێرکردن(قوربانی):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هاوسەر یان کوڕ کەوا بەکاری چاکەی سوود بەباوك و دایکدەگەیەنێ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر فیتنەو ئاشووب، یاخود دژایەتی و شەڕو ئاژاوە یان سوودو قازانج لەراوەوە.

**خێروچاکە:** (نابلسی) دەڵێت: خێر لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:
+دوورخستنەوەی بەڵاو نەهامەتی.
+چاکبوونەوەی نەخۆش.
+رزق و رۆزی و خێر.

+راستگۆیی‌و ئەو ڕووداوەی باسدەکرێ.

*ئەگەر ئەوەی لەخەودا دەیکرد خێروچاکبوو باشدەبێ بەڵام ئەگەر خراپبوو وەك مردارەوەبوو و مەی بەخراپی هەڵسوکەوتی لەماڵەکەیداکردوە.

*ئەگەر شتێکی باشیکرد بەخێر بەڵگەیە لەسەر نەش‌ونماکردنی.

*ئەگەر خاوەن بێستانێك لەخەودا خێریکرد دەوڵەمەندییە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەژاری‌و پێداویستی بۆ خێر.

*ئەگەر خێریکرد بەداوێنپیسێك دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تەوبەکردنی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ناچارکردنی کەسێکی ئیرەییبەرو داپلۆسانی دوژمنان چونکە شەیتان ناچار دەکات.

*خێری نهێنی ئەگەر خێرکار تورەبوو لەگوناهەکانی خۆشدەبێ.

*دەگونجێت خێرکردن بەنهێنی نزیکی بێت لەفەرمانڕەواو زانایان.

*ئەگەر بینی داوای لێدەکرێ‌و خێردەکات ئەگەر زانابوو خەڵکی فێری زانیاریدەکات چونکە پرسیارکار قوتابی زانیارییە، ئەگەر دەستەڵاتداربوو کۆمەڵێك دادەنێت، ئەگەر بازرگانبوو کۆمەڵێك سوود لەکڕین‌و فرۆشتن وەردەگرن یان ڕێنمونی دەکرێن بۆ کارێك ، ئەگەر پیشەکاربوو یاخود بازاڕیبوو کرێگرتەیەك فێری پیشەوکردار دەکات، ئەگەر نانیدا بەهەژارێك پیاوێك دەترسێ‌و دڵنیادەبێت‌و لەغەم‌و پەژارەکانی قوتاردەبێت، ئەگەر نانیدا بەبێباوەڕێك دوژمنێك بەهێز دەکات ئەویش تاقیدەکرێتەوە.

*دەگونجێت خێر بەڵگەبێت لەسەر:

+یادو زیکری خوا.

+سەردانی گۆڕستان.

+کرداری چاك‌و باش.

**خێڵی چاو:** (نابلسی) دەڵێت: خێلی چاو بەڵگەیە لەسەر شکانی پەیمان یاخود لەقسەی خۆ پەشیمانبوونەوە.

**خێو(سێبەر):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵ‌و داراییە کەلەیەن هاوڕێیەکەوە پێیدەگات.

*ئەگەر ژنێکی دووگیان بیبینێ کوڕی دەبێت.

# د دال

## دا

**دابەزین( هاتنەخوارەوە ):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەشاخێکەوە هاتەخوارەوە باشە، دەگونجێت هاتنەخوارەوە بەڵگەبێت لەسەر خەشمو قینی خودا بەپێی ئایەتی: ﴿وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ (البقرة: ٣٦).

*هاتنە خوارەوە لەئاسمانەوە دوای سەرکەوتن سەر شۆڕییە پاش شکۆمەندیو بەرزی، هەروەها وتراوە بەدەستهێنانی نازو نیعمەتی دنیایە لەگەڵ پلەوپایەی ئاینی.

*ئەگەر هاتنەخوارەوەی لەشاخێکەوە بینی دەرووی لێدەکرێتەوە، هەروەها وتراوە: بەڵگەیە لەسەر گۆڕانی کاروباری ئەستەمو مەحاڵ.

*ئەگەر بینی لەشوێنێکی بەرز هاتە خوارەوە یان لەسەربانو کۆشکێکەوە لەحاڵو بارێك پاشگەز دەبێتەوە کەلەسەرییبوە.

*ئەگەر بینی لەپلیکانەیەکی دێرین دێتە خوارەوە سوودو قازانج لەبازرگانیەکەیدا ناکات.

*ئەگەر پلیکانەکە پچڕاو لەسەرییبوو نەیارو دوژمنەکەی زاڵدەبێت بەسەریا.

**داپۆشان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: داپۆشینم لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بێئاگایی خەوبینەرو فریوخواردنی.

(نابلسی) دەڵێت: : لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گەیشتن بە دوژمنو دەرخستنی ئەوەی دەیەوێت بیشارێتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دڵنیایی لەترسو بیم چونکە رۆچوونو پشوودانە.

**داپۆشراو( پەردە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی پارچەیەکی داپۆشراوی پۆشیوە دەبێت بەفەرمانڕەوای وڵاتێك ، ئەگەر شایستەبێت بۆکەسێکی ئاسایی ژنێکی دەوڵەمەند کەواکەسێکی بەسۆزو نزیکی نییە.

**داخستن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی دەرگای ماڵەکەی بەخشت هەڵچنی پارێزراودەبێت لەکاروباری دنیا، ئەگەر بەخشت نەبوو ناتوانێ لەدنیا خۆی بپارێزێ.

*ئەگەر بینی پتر بەتوندی دەرگای ماڵەکەی دادەخات بەلاّم دانـاخرێ ناتوانێ کارێك ئەنجامبدات.

*ئەگەر بینی جەنگاوەرێك دەرگایەك ئاوەلاّدەکات قەلاّیەك کوندەکات یان دەیکاتەوە ، ئەگەر پیاوێك کردیەوە پلان و خراپە بەرانبەر ئەوکەسە دەکات کەکونیدەکات و خێری بۆ ئاوەلاّدەبێ لەلایەن ئەو پیاوەوە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی دەرگایەکی نوێی کردەوە ژنێکی چاکدەهێنێ ئەگەر رەبەنبێت، ئەگەر هاوسەرداربێ لەژنەکەی جیادەبێتەوە.

*دەگونجێت داخستن لەدەرگایەکدا یان لەدەرگایتردا مانەوەی حاڵ و باربێت وەك خۆی بۆ خاوەنەکەی.

*ئەگەر بینی قفڵێکی داخست ژنێکدەهێنێ.

**داخکردن(سووتاندن):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: داخکردن چەن لێکدانەوەیەك هەڵدەگرێ ئەگەر شوێنەواری داخکردنێکی کۆنی یا تازەی بەخۆیەوە بینی لەپێستەکەیدا سامان و گەنجێك بەدەستدەهێنێ، ئەگەر گوێرایەڵی ئەنجامدا بۆ پەروەردگار دەیباتەوە، ئەگەر بۆ سەرپێچی خودابوو بەو گەنجنەیە داخدەکرێ خوداوەند دەفەرموێت: ﴿فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ﴾ (التوبة: ٣٥).

*هەروەها دەڵێن: شوێنەواری داخکردنی کۆن و تازە ئەگەر پێستی هەڵداو ئازارینەبوو باشترین چارەسەرەو بەهێزترینە لەوکاتەدا وەك چارەسەر مامەڵەی لەگەڵدەکرێ.

*هەروەها دەڵێن: داخکردن قسەیەکی بەئێش و ئازارە.

*هەروەها دەڵێن: داخکردنی خڕ خۆڕاگرییە لەکاروباری فەرمانڕەوادا یاخود موڵکە بەپێچەوانەی سوننەتەوە، یاخود بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری یا منداڵبوون.

*دەگێڕنەوە (ئەبوبەکر) (رەزای خوای لێبێت) وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەخەودا بینیم وەك لەسنگما دوو داخ و شوێنەواری سووتاوی هەبێت، ئەویش (ﷺ) فەرمووی: "کاروباری دنیا بۆ ماوەی دوو ساڵ دەگریتە دەست".

*پیاوێك بینی نەخۆشەو پزیشك نییە چارەسەرییکات لەگەڵ کەسێکدا ناکۆکی هەبوو پاش ماوەیەك نەیارەکەی زاڵبوو بەسەریا.

*پیاوێکیتر بینی باوکی نەخۆشکەوت ئنجا سەرئێشە روویکردەسەری چونکە بەڵگەیە لەسەر باوك.

*(ئەبی سەعدی واعیز)لەتەفسیری (گەورە)دا دەڵێ: ئەگەر بینی مرۆڤێك داخدەکات قسەی خراپدەکات بەرانبەری یاخود خراپەی دەستەلاتداری پێدەگەیەنێ، ئەگەر داخکردنەکە بەخرپیبوو خۆراگرییە لەکاروباری دەستەلاتدارو واژووی سوننەیە. هەروەها دەڵێن: ئەگەر رەگو دەمارێکی سووتاندو داخیکرد کچیدەبێ یان هاوسەر دەگرێ یاخود ژنەکەی لەلایەن پیاوێکی سەیرەوە دەبینرێ.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ئەگەر لەتەویڵو نێوچاویاندابوو یا لەتەشتدا بەڵگەیە لەسەر نەدانی زەکات، دەگونجێت داخکردن لەلایەن دەستەلاتدارەوە بێتە خوارەوە یاخود جیابوونەوەبێ لەکەسێکی بەڕێز، ئەگەر بەزێڕ یان زیو داخکرا بەڵگەیە لەسەر رژدیو رێگری یان نەدانی مافی خودا.

ئەگەر بەئاسن داخکرا بەڵگەیە لەسەر گوناهو تاوان.

**دادپەروەری:** (نابلسی) دەڵێت: فەرمانڕەوای ستەمکار لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خۆشحاڵی ژێردەستەکانیو شادی بردنە نێو دڵیان بەچەشنێ دڵنیایان بکات یاخود ماڵو داراییان بپارێزێو ئاوەدانی لەوڵاتو شاریاندا بڵاوبکاتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دادپەروەری لەنێوان منداڵو هاوسەرەکانیو ئەوەی دادپەروەری دەپارێزێ.

*ئەوەی دادپەروەربێ لەسەر سەرپێچی بەردەوام بێت تەوبەدەکاتو پاشگەزدەبێتەوە لەوگوناهو تاوانەی ئەنجامیداوە.

**دادوەر:** ئەگەر دادوەرانی لەشێوەیەکی باشدا بینی زانیاری باشی پێ رادەگەیەنن، یاخود رێنموونی دەکەن بۆ رێبازی راستو دروست.

*دەگونجێت دادوەر بەڵگەبێت لەسەر:

+ئەندازیارو زۆرلێکەر.

+هاوەڵایەتیو کۆبوونەوە.

+بەرگدروو.

+کەڵەشاگر.

*ئەگەر دادوەرێك بەڵگەیەكی دیارو ئاشكرای گوێی لێبوو لەشێتو ناتەواو یا گێلێكەوە یان لەگسكدەرێكەوە، یاخود ساوەربێژەرو ئەو فتیلەیەی لەحەمامدا دادەگیرسێتو خەڵكی سوودی لێوەردەگرن.

*دەگونجێت دادوەر بەڵگەبێت لەسەر باوكی بەرپرسو ماڵو منداڵی.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر دادوەرێكی بینی كاری دادگای وەرگرتو دادوەربوو تێیدا ئەگەر خەوبینەر بازرگانبوو كەسێكی بەویژدان دەبێت، ئەگەر ئاودێری بەدەستبوو یان كاروباری كێشانە هەربەوچەشنەیە.

*ئەگەر بینی دادگایی لەنێوان خەڵكیدا دەكاتو ستەمكارە تێیدا ئەگەر فەرمانڕەوابوو لادەبرێو لەكاردەخرێ، ئەگەر لەسەفەردابوو ڕێگەی لێدەگیرێ، وەگەرنا نازو نیعمەتەكانی خوداوەند دەگۆڕێو دەبێ بەبەلاو نەهامەتی.

*ئەگەر دادوەرێكی ناسراوی بینی وەك داناو زانا وایە.

*ئەگەر دادوەرێكی ناسراوی بینی ستەمدەكات لەحوكمكردنیداو خەڵكی ئەو شوێنە لەكێشانەیاندا دزیدەكەن.

*ئەگەر پیاوێك هاتە لای دادوەرەكەو بەویژدانبوو لەگەڵی خەوبینەر دادوەر دەبێت بەرانبەر دژو نەیارەكانی.

*ئەگەر غەمو پەژارەداربوو دەرووی لێدەكرێتەوە ئەگەر دادوەرەكە ستەمكاربوو لەدادگاییدا ، ئەگەر لەنێوان خۆیو مرۆڤێكدا دژایەتیو ئاژاوەهەبوو دادپەوەرنابێت.

*ئەگەر دادوەرێكی سووكی بینی لەكێشانەداو هەڵیبژارد پاداشتی لای خوداوەند هەیە، ئەگەر كێشانەكەی لابرد بەڵگەیە لەسەر گوناهو سەرپێچی.

*ئەگەر بینی دادوەرێك فلس كێشانەدەكات یاخود درهەمی خراپ لادەداتو گوێبیستی گەواهیدانی نادروستدەبێتو بەو حاڵەوە دادوەریدەكات.

*دادوەری نادیار لەخەودا پەروەردگارە.

*ئەگەر بینی بوە بەدادوەر یان دانا یاخود پیاوچاك یا زانایەك پلەوپایەی بەرزو ناوبانگی باشەو دنیانەویستی دەردەكات لەگەڵ زانیاری، ئەگەر شایستەی ئەوەبوو ئەوە بەكاروبارێكی بەتاڵ تاقیدەكرێتەوەو وتەی وەردەگرێ بەوەی تاقیكراوەتەوە هەروەك وتەی دادوەر لەدادگادا پەسەند دەكرێ.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر رووخساری دادوەری بەرووییەكی گەشەوەبینی

مـژدەو خۆشحاڵی بەدەستدەهێنێ ، ئەگەر شوێنی دادوەرێکی بینی ترس‌وبیم‌و ئاژاوەی دەستگیردەبێ.

*هەروەها دەڵێن: شوێنی دادگایی‌و وتەبێژان‌و قەرزو شەریعەت لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بشێوی‌و غەم‌و پەژارەو تیاچوونی ماڵ‌و سامانێکی زۆر لەسەرجەم خەڵکی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی نهێنی‌و لەنەخۆشیدا بەڵگەیە لەسەر دەریا.

*ئەگەر نەخۆشێك بینی دادگایی دەکات بزرکاندنی بەخێردەبێت‌و چاکدەبێتەوە.

*ئەگەر نەخۆشێك بینی دادگایی دەکرێ دەمرێ.

*ئەگەر یەکێك کەلەبەربەرەکانی‌و شەڕدابوو بینی لەشوێنی دادوەران دانیشتوە یان خۆی دادوەرە شکستناهێنی‌و نادۆڕێ لەبەرئەوەی دادوەران دادگایی خۆیان ناکەن.

(نابلسی) دەڵێت: دادوەری ناسراوو بەناوبانگ بەپزیشك لێکدەدرێتەوە.

**دار( درەخت )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: داری ناسراو هەوڵدانە لەگەڵ شتێکدا یان لەگەڵ پیاوێکدا هەوڵدەدات‌و دەکۆشێ بەئەندازەی جەوهەری دارەکەو سوودو قازانجی.

*ئەگەر بینی خاوەنداره بۆ کۆمەڵە دارخورمایەکی زۆر لەشوێنێکدا نەبوونی دارخورمایە بۆی ، ئەگەر لەباخێکدابوو یان لەزەوییەکدا نەدەگونجا بۆئەو کۆمەڵە دارخورمایە گرێیە بۆ یەکێك خاوەنی بێت.

*ئەگەر بینی بەروبوومەکەی بەدەستهێنا ماڵ‌و سامان لەپیاوێکەوە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر دارگوێزبوو پیاوێکی کوێری رژدی بۆڵەبۆڵکارو سروشت تاڵ‌و کرژە، هەروەها بەروبومەکەشی ماڵ‌و سامانێکە بەناڕەحەتی وەبەردێت.

*ئەگەر بینی گوێزێکی بەدەستهێنا دەجووڵێت‌و دەنگەدەنگ دەکات، گوێز ئەگەر جووڵا یاخود یاریکرد دەنگەدەنگ‌و قاوقیژە یان قومارکەرێکە زەفەر بەهاوەڵەکەی دەبات ، هەموو شتێکیش قوماری پێبکرێ بەو چەشنەیە ئەگەر قوماری لەگەڵ هاوەڵەکەیکرد زەفەر دەبات بەوەی داوایکردووە.

*ئەگەر خۆی لەسەر دارگوێزێك بینیەوە وابەستەی پیاوێکی عەجەمی زلدەبێت، ئەگەر هاتە خوارەوە لەسەری لەنێوان خۆی‌و ئەوپیاوەدا دەبێت‌و بەجێنایەت، ئەگەر کەوتە

خوارەوە لەسەری یاخود مرد بەدەستی پیاوێکی گەورەی لەشولار زلڵەو کەتە دەمرێت ، ئەگەر دارەکە شکاپێوەی پیاوە کەتەکە تیادەچێتو ئەوەی دەکەوێتە خوارەوە تیادەچێت، ئەگەر لەکاتی کەوتنەخوارەوەیدا نەمرد قوتار دەبێت.

*هەروەها ئەگەر بینی دەستو قاچی شکا لەوکاتەدا لەتیاچوونو فەوتان نزیکدەبێتەوەو بەلآیەکی گەورە رووی تێدەکات بەلآم قوتاردەبێت لێی.

هەروەها هەموودارێکی مەزن هەمان لێکدانەوەی گوێز هەڵدەگرێو لەبنەڕەتدا دەدرێتەپاڵ عەجەم.

*دار نەبگ پیاوێکی رێزدارو دەستو دڵفراوانە بەفەڕوپیتە بەپێی دارو بەروبوومەکەی.

*ئەگەر دارێکی بنەڕەتی نادیاری بینی لەماڵی خۆیدا ئاگرێك لەوێدا کۆدەبێتەوە یاخود ماڵێکی ئاگرین دەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا ﴾ (یس:٨٠).

*دەگونجێت دار لەماڵ یان بازاڕدا شەڕو ئاژاوەبێت لەنێوان کۆمەڵێکدا ئەگەر دارەکە نادیاربێت بەپێی ئایەتی:

﴿ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴾ (النساء: ٦٥).

*داری مەزن کەهیچ بەروبوومێکی نەبێت پیاوی تۆکمەو بەهێزەو خێری تێدا نییە.

*ئەگەر داری بۆنخۆشبێت پیاهەڵدانو ستایشی ئەوکەسە وەك بۆنی ئەو دارە وایە.

*هەموو دارێکی بەروبوومدار پیاوی فەڕوپیتدارە بەئەندازەی ئەو بەروبوومە لەبەدەستهێنانو سوود لێوەرگرتنیدا.

*ئەو دارەی دڕکی پێوەیە پیاوێکی رەقی ئەستەمە.

*ئەگەر ئاوی لەدار وەرگرت سوودو قازانج لەماڵێك وەردەگرێ کەلەپیاوێکەوە بەدەستیهێناوەو دەدرێتە پاڵ جۆری دارەکە.

*ئەگەر بینی لەبێستانو باخەکەیدا دار دەڕوێنێ کوڕی دەبێتو لەتەمەندا وەك درێژیو کورتی ئەودارەن.

*ئەگەر داری رواوی بینی لەخۆیەوە پیاوانێك روودەکەنە ئەو شوێنە بۆ گریانو غەمو پەژارە.

*داری بەهێ پیاوێکی ژیرە سوود لەئەقڵو ژیری وەرناگرێ بەهۆی زەردی بەروبوومەکەیەوە.

**دار هەنار**: پیاوێکی دیندارو خاوەن دنیایەو درکەکەی رێگرە لەسەرپێچی ، برینی دار هەنار برینی سۆزو پەیوەندی خزمایەتییە.

*__دارزەیتون__: پیاوێکی پیرۆزی بەسوودە بۆ خانەوادەکەی، بەروبوومەکەشی غەمو پەژاەیە بۆ یەکێك بەدەستیبهێنێت یان ببێت بەخاوەنی یاخود بیخوات.

*دەگونجێت دار زەیتون بەلگەبێت لەسەر ژنی دووگیانو منداڵبوونو بەروبوومی دوای ئەوە، دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر فرۆشگاو دوکانو بەندەو خزمەتکارو ئاژەڵو سەرجەم شوێنی بەناوبانگ بەخواردنو ماڵودارایيو گەنجینە.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر ئاسنو مەزهەب چونکە خوداوەند داری باشی چواندوە بەوشەیەکی باش، ئەمەش دارخورمایە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەپیاوێکی موسوڵمان لێکیداوەتەوە.

*راڤەکاران دەڵێن: ئەگەر دارو درەخت بەلگەبێت لەسەر کردارو ئاینو دەروونی خاوەنەکەی گەڵاکانی بەلگەیە لەسەر رەوشو هەڵسوکەوتو جوانی جلوبەرگیو، لقەکانیشی بەلگەیە لەسەر رەچەڵەكو براو بیروبۆچوونی.

ناوەڕۆکیشی بەلگەیە لەسەر سەرجەم بەشەکانی دیکەیو ئەو کردارانەی پەنهانیکردوە . توێکڵەکەشی بەلگەیە لەسەر رووخسارو پێستەکەیو ئەو کردارانەی خۆی پێجوانەدەکات، لەکاتیکدا ئاوەکەی بەلگەیە لەسەر باوەڕو خواناسیو موڵكو ژیانی بۆ هەموو مرۆڤێك بەئەندازەی خۆی.

*دەگونجێت بەپێچەوانەی ئەو ریزبەندیو پۆلێنەوە ریزبەندیانکردبێ.

*ئەگەر خۆی بینیەوە لەسەردارێك یاخود بوو بەخاوەنیو نیشانیدرا تەماشای حالو باریدەکریْ لەگەڵ حاڵو باری دارەکەدا ، ئەگەر ئەوکەسەی خەوی پێوە بینرا مردوبوو سەیری سیفەتو تایبەتمەندی ئەودارە دەکریْ ئەگەر دارەکە گەورەو جوانبوو مردوەکە لەبەهەشتدایە، ئەگەر دارێکی ناقۆڵاو درکاوییو رەشو بۆگەنبوو لەسزاو دۆزەخدایە.

*دەگونجێت داری زەقوم بێت بەهۆی بێباوەڕییەوە بەو دەرەنجامە گەیشتبێ.

*ئەگەر نەخۆشێك خەوێکی وای بینی رووبەو دەرەنجامە دەچێت بەپێی دارەکە، ئەگەر زیندوبوو تەماشای حاڵو باریدەکریْ، ئەگەر پیاوێکبوو

خوازیاری هاوسەرگیریبوو یان ژنێکی مێرداربوو هەریەکەیان هاوسەرێك بەدەستدەهێنێت بەپێی حاڵو شێوەی دارەکە، ئەگەر هاوسەری هەریەکێکیان لەکاتی بێداریدا نەخۆشبوو تەماشای سەردەمو کاتەکەی دەکرێ ، ئەگەر ئەو دارەی خۆی بەسەریەوە بینیوەتەوە، لەکاتی پشتهەڵکردنی سەردەمدابوو ئاوی کرایە ژێر ئەو نەخۆشە دیسان چاکدەبێتەوەو دیاردەکانی ژیان لەلەشو لاریدا سەرهەڵدەداتەوە، ئەگەر لەدوایەوەبوو ئەو نەخۆشە دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگارو دەچێتەوە نێوخاكو تیادەچێت. ئەگەر لەفرۆشگاو دوکانو شوێنی بژێوی خۆیدا بینی بەڵگەیە لەسەر بژێوی رزقو رۆزی، ئەگەر لەپێشەوەبوو سوودو قازانج وەردەگرێ.

*ئەگەر لەدوایەوەبوو زەرەردەکاتو هەژار دەکەوێ، ئەگەر لەمزگەوتێکدا بینی بەڵگەیە لەسەر ئاینو نوێژی.

*ئەگەر لەکۆتایی رۆژگاردابوو بێئاگا دەبێت لەئاینەکەیو هۆشی بەنوێژەکانیەوە نامێنێت.

*ئەگەر لەپێشەوەبوو پیاوی چاكو باشەو کردارەکانی بۆ جۆر دەبێو گوێڕایەڵیەکەی پاكو بێگەرد دەبێ.

*ئەگەر خاوەنی کۆمەڵە دارێکی زۆربوو دەبێت بەبەرپرسی کۆمەڵێكو، یاخود لەدادگا یا فتوا یا پێشەوایەتی یاسەرکردایەتی پێدەسپێرێ.

*ئەگەر بینی هەموو دارەکان لەماڵێکدایە پیاو یا ژنە یاخود هەردووکیانە کۆدەبنەوە بۆ خێر یان شەڕ ، ئەگەر بەروبوومەکەی پێوەبینیو خەڵکی لێیدەخوارد، ئەگەر بەروبوومەکەی بەڵگەبێت لەسەر خێرو رزقو رۆزی ئاهەنگی دوای ژنهێنانەو ئەو دارانەش سفرەو خوانی نانخواردنە.

*ئەگەر بەروبومەکەی خراپو قێزەونبوو بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو پرسەو تەعزیەو خواردنی تێدا دەخۆن، هەروەها بەو چەشنەیە ئەگەر لەماڵەکەدا نەخۆش هەبوو، ئەگەر بەروومەکەی نادیاربوو تەماشادەکرێ ئەگەر لەپێشەوەی دارەکەدابوو خواردنی ئاهەنگو خۆشییە، بەڵام ئەگەر لەدواوەبوو بەلاو نەهامەتییە بەتایبەت ئەگەر لەکاتی بێداریدا نیشانەی یەکێك لەو دوانە هەبن.

*ئەگەر بینی دارێك کەوت یا بڕا یان سووتا یاخود رەشەبایەکی توند شکاندی پیاو یا ژنە تیادەچن یاخود دەکوژرێن ، ئەگەر لەماڵەکەیدا

کەسێکی نەخۆش هەبوو دەمرێت یان زیندانیدەکرێ یاخود سەفەر دەکات، ئەگەر لەمزگەوتدابوو ژن و پیاوێکی ناودارن دەمرن یا دەکوژرێن بەشێوەیەك ناوبانگدەردەکەن، ئەگەر دارخورمابوو پیاوێکی بەرزو بالآیە یاخود بەهۆی دەستەلآت یان زانیاری یان ژنە فەرمانڕەوا یاخود دایکی سەرۆکێکەو بەدەستیدەهێنێت، ئەگەر دار زەیتونبوو زاناو ئامۆژگاریدەر یان دادوەر یاخود پزیشکە ، پاشان بەو پێودانگە لێکدەدرێتەوە.

* ئەگەر بینی دارێکی رواندو هەڵواسرا رێزداری بەدەستدەهێنێت.

* ئەگەر تۆوێکی چاندو هەڵتۆقا یان هەڵنوتا غەم و پەژارە رووی تێدەکات، ناشتنی دارمێو بەدەستهێنانی رێزو شکۆمەندییە.

* دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم کەسێك پێی وتم: ئەگەر دەتەوێت چاکبییتەوە لەو نەخۆشیە بیبە وەگەرنا بیخۆ، (ئیبن سیرین) وتی: ئەوە رێنومایی کردووی بۆ خواردنی زەیتون، چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ زَيْتُونَةٍ لَا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ ﴾ (النور: ٣٥).

* هەروەها دەڵێن: ئەگەر لەزستاندا مێوی بینی بەروبوومی پێوەبوو وابەستەی ژن یا پیاوێك دەبێت و وادەزانێ دەوڵەمەندە.

* هەروەها دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەخەودا بینیم زەیت دەکەمە بنی دارێکی زەیتون، ئەویش لێی پرسی: بەسەرهاتەکەت چییە ؟ وتی: لەمنداڵیدا کرام بەکۆیلەو پاشان ئازادکرام، پاشان گەورەبووم، ئەویش لێی پرسی: ژنت هەیە؟ وتی: نەخێر بەڵام کەنیزەکێکم کڕیوە، وتی: بزانە دایکت نییە، کاتێ گەڕایەوە کەوتە پشکنین هەتا بۆ یدەرکەوت دایکییەتی.

* هەروەها دەگێڕنەوە پیاوێکیتر دێتەلای، دەڵێ: لەخەودا بینیم دارزەیتونێکم گوشی و ئاوەکەیم خوارد، (ئیبن سیرین) وتی: لەخوابترسەو خەونەکەت ئەوە دەردەخات ژنەکەت خوشکی شیریتە، کابرا کەگەڕا بەدوای ئەوەدا بینی قسەکەی (ئیبن سیرین) لەجێی خۆیدایە.

* ئەگەر بەروبومی لەدارێککردەوەو لەحاڵی دانیشتندابوو، ماڵ و سامانێکە بەبێماندوبوون و هیلاکی بەدەستیدەهێنێت، ئەگەر دارەکە دوا

لەگەڵی بەوەی شیاوو گونجاوە کارێکی سەیرەو خەڵکی سەرسامدەبن پێی.

*هەروەها دەڵێن: دار ژنە ، ئەگەر شتێکی وەهای تێدابوو بەڵگەبێت لەسەر ژن ، هەروەها دەبێت ئەو ژنە دایکی سەرکردە یان کچی سەرۆك یاخود خزمەتکاری بەرپرسو فەرمانڕەوابێت.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی دارو درەخت بەڵگەیە لەسەر شەڕو ئاژاوە، دارودرەختی نادیار بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو برین بەتایبەت ئەگەر بەشەو لەخەودا بینی مەگەر بچێتە ژێر سێبەرەکەیەوە بەهۆی گەرما یان لەکاتی باراندا ئەوکات بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزیو پشتبەستن بەپلەوپایەداران ، ئەگەر لەسەر بیدعەبێت کۆتایی پێدێتو دەستی لێهەڵدەگرێ ، ئەگەر موسافیریش بێت موسوڵماندەبێت ئەگەر بەروبوومی تێدا نەبێت پشت بەوەدەبەستێ پشوودانی تێدایەو بەدەر لەزانیاریو زانست.

*هەندێکدار هەیە تایبەتە بەبۆنو هەندێکیش تایبەتە بەخۆراك، ئەوەی تایبەتە بەخۆراکەوە لەخوار ئەوەیە تایبەتە بە بۆن ، ئەودارانەی بۆ بۆن بەکاردەهێنرێن وەك خەنەو گوڵ بینییان بەڵگەیە لەسەر پیاوچاكو زانیاری بێکردەوە یان گوتەی بێکردار.

*ئەو دارەی بۆ خۆراکە وەك نارنجو لیمۆو لالەنگی گوڵەکەی بۆنخۆشەو بەروبوومەکەی سوودمەندە بینینی بەڵگەیە لەسەر چاکی رووخسارو ناواخنی کردارو وتەو وابەستبوونی بەیەکەوە.

*ئەوەی پابەندی خۆراکەو بۆنی نییە وەك خورماو گوێزو...بینینی بەڵگەیە لەسەر ئەو ناودارانەی هیچیان لێوەرناگیرێ بەماندوونو هیلاکی نەبێت.

*بینینی ئەو دارانەی کەنە تامو نەبۆنیان هەیە وەك نەبەنگو دار حەیزەرانو داربۆیەو ...بەڵگەیە لەسەر رژدیو بەخیلی.

*هەموو دارێك گەڵاکانی لێبکەوێت بەڵگەیە لەسەر هەژاریو دەوڵەمەندیو پاراستنو ئاهەنگو غەمو پەژارە، ئەو دارەشی گەڵاکانی نەوەرێ بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژیو بەردەوامی رزقو رۆزیو چەسپاندن لەئایندا.

*ئەگەر بینی لەسەر چەن دارێك پاڵکەوتوە منداڵی زۆر دەبێت.

*ئەگەر بینی لەسەر درەختێکە قوتار دەبێت لەوەی مەترسی لێیەتی،

تویکلیدار فەرو بەرەکەتی کەسێکەو بەروبوومەکەشی سەربازەکانیەتی.

*ئەگەر دەستەلاتدارێکی بینی دارێکی بڕی بەتەور چەن پیاوێك دەستنیشاندەکات بۆ کارێك و تێدا لەناودەچن، ئەگەر بەداس بڕی داوایەکیان لێدەکات ناتوانن بەجێی بهێنن.

*ئەگەر بینی ماڵوسامانی لەدارێکەوە وەرگرت ماڵێکی رێزداری دەستدەکەوێت لەوپیاوانەوە کەدەدرێنە پاڵ جۆری دارەکان.

*گەلای درەخت درهەمی ساغە.

*ئەگەر درەختەکانی بینی پەتیان پێوەبەستوە وەچەی بەرپرس و فەرمانڕەوای ئەو دارە زۆر دەبێ یاخود شوێنکەوتەکانی لەلای کۆدەبنەوە.

*ئەو دارەی لەماڵدایە ئەگەر لەپێشی ماڵدابوو نێرەکانی مێیە ئەگەر گەورەبوو.

*ئەودارەی یاساغکرا لەسەر (ئادەم) هیچ خێرێکی تێدا نییە.

*دارودرەخت بەلگەیە لەسەر وتەی پەروەردگار.

*دارودرەخت بەلگەیە لەسەر نیعمەتی خوایی.

*دارو درەختی وشك بەلگەیە لەسەر رێنومایی و رزق و رۆزی چونکە سەرچاوەی وزەیە.

*هەمووداریکی سەیرو نامۆ بەلگەیە لەسەر پیاو یا ژن یاخود کاسبی گومانلوی یاخود زانیارییەکی کۆن و دێرین.

*دانیشتن لەژێرداردا لەگەڵ خەلکیدا بەلگەیە لەسەر رەزامەندی خوداوەند لەخەوبینەرو شوێنکەوتنی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ، ئەگەر خەوبینەر بێباوەڕبوو بڕوا دەهێنێت و گەر سەرپێچیکاربوو تەوبەدەکات، دەگونجێت پەیمانبدات بەدەستەلاتداری گوێڕایەڵی ئەوەبێت ، ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێکدابوو یادی خوایاندەکردەوە داری (طوبی) یەو لەرۆژی قیامەتدا لەژێر سێبەرەکەیدا دادەنیشێ.

*بینینی داری (طوبی) لەخەودا بۆئەوەی دەچێتە ژێرسێبەری یان پاڵی پێوەدەنێ بەلگەیە لەسەر چارەنووسی باش. دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر پچڕان و یەکلاییبونەوە بۆ بەندایەتی و سوود وەرگرتن لەهاوەلان یاخود لەخاوەن پلەوپایە.

*بینینی داری چیاو دۆڵو شیو بەڵگەیە لەسەر سوننەت ئەنجامدانو رزقو رۆزییەك پێشبینی نەکراوە.

*دارو درەختی پیس وەك وشەی پیس وایەو لەسیرو پیازو گوژاڵك دەچێ.

*ئەگەر بینی لەدارێك بەدەر لەبەروبوومەکەی دەچنێتەوە ماڵو سامانێك بەحەرامی دەبات.

*ئەگەر دارێکی بینی بەروبوومی بەدەر لەبەروبوومی خۆیگرتبوو ژنێکە دووگیاندەبی لەپیاوێکیتر ئەگەر داری خۆیبوو هاوسەرەکەیەتی.

*ئەگەر دارێك ببڕێتەوە مرۆڤێك دەکوژێت، هەروەها دەڵێن: داربڕین نەخۆشییە تووشی داربڕو خانەوادەکەی دەبێت، ئەگەر بەرزبوەوە پیاوە ، ئەگەر لەسەردارەکە هاتەخوارەوە لەپیاوێك جیادەبێتەوە ، ئەگەر بینی لەسەردارێك کەوتەخوارەوەو مرد لەکوشتاری پیاوێکدا دەمرێ، ئەگەر دەستی شکا براوخوشکی لەکوشتاری ئەوپیاوەدا تیادەچن، ئەگەر قاچەکانی شکا ماڵو سامانی لەناکۆکیدا تیادەچێت ، ئەگەر ئەوداره درایە پاڵ ئاین وەك دار زەیتون ، ئەگەر بەچڕی بەدیکرد ئەو دڕكو داڵە لەخراپە دەیگرێتەوە، ئەگەر دار زەیتوونبوو زاناو ئامۆژگاریدەرو رێبوارو دادوەرو پزیشکە بەپێی ئەو لێکدانەوەیە سەرجەم دارو درختەکان لێکدەدرێتەوەو سوودو قازانجو ناوەرۆکی دیاریدەکرێ ، هەروەها ئەگەر تۆوی چاندو هەڵتۆقا غەمو پەژارەیە تووشیدەبێت.

*ناشتنی دارمێو رێزو پایەدارییە.

*ئەگەر لەزستاندا دارمێوی ناشت یاخود دارێکیتر بەژنێك فریودەخوات یان بەپیاوێكو ماڵو سامانی بەفیرۆدەچێتو وادەزانێ دەوڵەمەندە.

*<u>داری گوژاڵك:</u> پیاوێکی چاکی ترسنۆکە هیچ ئاینێکی نییە بەلاَم دەوڵەمەندە.

*<u>دارساج:</u> فەرمانڕەوا یا زاناو شاعیر یاخود ئەستێرەناسە.

*سەرهەڵدانی دارخورما بەڵگەیە لەسەر کوڕ، دارخورمای وشك پیاوێکی دووڕوە، ئەگەر رەشەبا دارخورمای دەرهێنا لەوشارەدا نەخۆشی بلاَودەبێتەوە، دەگونجێت سزاو خەشمی دەستەلاَتداربێ.

*<u>دارمۆز:</u> پیاوێکی دەوڵەمەندە دینو دنیا رێکدەخات.

*دار عەناب[1]: پیاوێکی شادو خاوەن پلەوپایەیە.

*دار هەنجیر: پیاوێکی بەکەڵكو سوودە بۆ خانەوادەی دوژمنەکانی رووی تێدەکەن چونکە مار روودەکاتە دار هەنجیر.

*دار توو: پیاوێکی سەخیو دەستو دڵفراوانە لەگەڵ خەڵکیو خانەوادەو کەسەنزیکەکانیو کەسانی لاوازو ماڵو دارایی زۆرەو، روح سووکە بۆ خانەوادەو هاوەڵانیو دەستو دڵفراوانو رووخۆشە.

*داری قەیسی: پیاوێکی جێگیرە بەڵام سوودی لێوەرناگرێ، هەروەها دەڵێن پیاوێکی رووخۆشە، هەروەها دەڵێن: پیاوێکی دووڕوە یان ژنێکی خۆشحاڵەو ئەوەی لێیدەکاتەوە مارەی دەبڕێ.

*دارسێو: پیاوێکی بەهیمەتە.

*دار قۆخ: پیاوێکی دەوڵەمەندی ئازایە ماڵو سامان زۆر کۆدەکاتەوە.

*پیاوێکی جێگیرە لەخێرداو توندوپتەوەو ماڵو دارایی زۆرە.

*دارگەز: پیاوێکی دووڕوە سوود بەهەژاران دەگەیەنێتو زیانبە دەوڵەمەند.

*دار لیمۆ: پیاوێکی بەسوودو فرە قازانجە، هەروەها وتراوە ژنێکی ماڵو سامانداری بەناوبانگە بەخێرو سوود لەهەموو حاڵو بارێکدا.

**داربخورد**: (نابلسی) دەڵێت: پیاوێکە بەباشی پێیدا هەڵدراوەو باسکراوە، ئەگەر داربخوردێکی بەدەستی خۆیەوە بینیو شتێکی لەدەستدابوو دەیدۆزێتەوەو گوێبیستی قسەو وتەیەکی باشدەبێ.

*ئەگەر بۆنی دار عودیکرد یان دوکەڵی بینی گوێبیستی قسەی باشدەبێو دەترسێ.

*ئەگەر بینی داربخوردێ لەماڵەکەیدا روا کوڕێکیدەبێو دەبێت بەگەورەو سەرداری نەتەوەکەی.

**داربڕەوە( گردەبڕ )**: (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ئاشەوان، وردەدار وەك ساوەرە.

**داربەروو**: (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ماڵێکی بەسوودو قازانج لەگەڵ شکۆمەندی جێگیرو چەسپاو.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تێکەڵبوون لەگەڵ کەسانی غافڵگیر یاخود لەرێدەرچوانو یاخیبوان یاخود شوێنو جێگەی پیاوچاکان.

---

[1] **عەناب**: دارێکە لەدار زەیتوون دەچێتو دەنکێکی سووری هەیە. (وەرگێڕ)

**دارتـــاش:** (ئـيبن سـيرين)دەڵێـت: پـەروەردەكاری مەردومـە لـەكاروباری دنيـادا، چـونكە دارو تەختـە ئـەو كەسانەن لەئاينەكەياندا خراپەكارن.
(نابلـسی)دەڵێـت: بينينـی دارتـاش بەڵگەيـە لەسـەر بەرپەرچـدانەوەی دووڕوانو ناچاركردنيان بەوەی دەبێت ئەنجامی بدەن.
*دارتاشی بەلەمو كەشتی: سەفەرە.
*دارتاشـی بـازاڕ: سـوودو قـازانجو موڵكە.
*دارتاشی دەرگا: هاوسەرو منداڵە.
*دارتاشی هاجاڕ: كێڵانو كشتوكاڵە.
**دارحــەيزەران:** پيـاوێكی سـپڵەيە لەخەودا، ئەگەر خۆی لەدارحەيزەران بينيـەوە پەيوەنديـدەكات بـەپياوێكی رەقی سپڵەی غەوارەوە.
*هــەروەها دەڵــێن: دارحــەيزەران پياوێكی رێزداری پارێزراوە.
**دارخورمـا:** (ئـيبن سـيرين) دەڵێـت: پيـاوێكی زانايـە لەگـەڵ كوڕەكەيـداو بڕينی مردنييەتی.
*دارخورمـا پيـاوێكی بـەڕێزی زانـاو شكۆمەندەو خـەڵكی بـەگوێی دەكـەنو بناخەكـەی هۆزەكەيـەتیو خوداوەنـد دەفـەرموێ ﴿ ولأصَلِبَنَّكُمْ فِي جذُوْعِ النَّخْلِ﴾(طه: ٧١).
*پوشـی دارخورمـا زيـادبوونی منـداڵو وەچەيە.
*بەدەسـتهێنانی كۆمـەڵێ دارخورمـای زۆر دەسـتەڵاتو بازرگـانیو سـوودو قازانجە.
*دەگوترێـت يـەك دارخورمـا ژنێكـی بـــەڕێزی داوێنپـــاكی خێرداربێـــت. دارخورمای وشكيش پياوێكی دووڕوە.
*ئەگەر بينی رەشەبا دارخورمای لـەبن دەرهێنـا لەوشـوێنەدا بـەڵاو نەهامـەتی دەكەوێتـەوە، دەگوترێـت سـزابێتو لەوشـارەدا بڵاوببێتـەوەو دەركـەوتنی مـاڵو سامانە خوداوەنـد دەفـەرموێت: ﴿لَهَا طَلْعٌ نَضِيد ، رِزْقَا للعِبَاد﴾ (ق:١٠- ١١).
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر دارخورمايـەكی بينـی بڕابـوو ئـەوەی لەبەردەميدايـە سەفەرێكی خراپـە يـان ئـاژاوەو شـەڕی تێدادەكات.
*دارخورما پووری مرۆڤە.
*ئەگەر نـاوكی بينـی بـوە بـەدارخورما منـداڵو دەبـن بـەزانا يـاخود پيـاوێكی لاوازو زەبوون بەرزو بڵند دەبێتەوە.
*هـەروەها دارخورمـا بەڵگەيـە لەسـەر تەمەندرێژیو منداڵ.
*دارخورمـا ژنو لانـەو زەویو موڵـكو جلوبەگو كوڕو زانايە.

*ئەگەر بینی دارخورمایەکی بڕی ئەو بارەی ئەوی تێدایە لەبەربەرەکانیو ئاژاوەو دەستەلاٴتو سەفەرو کاری خراپ تێدا سەرکەوتوو دەبێت.

**دارستان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دارستانو جەنگەلاٴن سوودی لێوەرناگیرێت چونکە بناغەی (دغل) دارو درەختی چڕو پڕەو ، راوچی خۆی تیا دەشارێتەوەو داوەکەی هەڵدەدات بەبێئەوەی بزانێت ، ئەگەر هاتوو بینی ئەو بێشەو دارستانە مولکی کەسانیترەو بەجەنگ دێت لەگەڵ گەلو نەتەوەیەکدا خاوەن ئەو سیفەتەبنو زاڵدەبێت بەسەریاندا.

**دارفرۆش:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دارفرۆش پیاوێکی دووزمانی شەڕو ئاشوبگێڕە.

(نابلسی)دەڵێت: دارفرۆش بەڵگەیە لەسەر خاوەنی میراتی، چونکە مامەڵە دەکات لەگەڵ ئەو دارانەی وشکبوە، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر سوودو قازانج بەتایبەت لەوەرزی زستاندا.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر قسەو وتە گواستنەوەو گوناهو تاوان.

(ئیبن سیرین )دەڵێت: دارفرۆش سەرۆکایەتی دووڕواندەکات.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی دارفرۆش بەڵگەیە لەسەر ئاوەدانی دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دووڕوویی.

**دارگەز:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دارگەز پیاوێکی زیانبەخشی دووڕوە لەئاستی دەوڵەمەنداو سوود بەهەژاران دەگەیەنێ.

**دارو پەردووی کۆکراوە:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەی خێرە بۆ سەرجەم خەڵکی.

**دارو درەختی وشك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی داروچیلکە کۆدەکاتەوە لەسەرزەوی دەبێت بەکەسێکی قسەهێنەرو قسەبەر بەپێی ئایەتی: ﴿وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾ مەبەستی قسەهێناوو قەسبردنە، هەروەها لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: "ئەوەی زۆربڵەیە وەك دارفرۆش وایە بەشەو" داریش دووزبانییە سووتاندنیشی هەوڵدانە لەلای فەرمانڕەواو دەستەلاٴتدار.

(نابلسی)دەڵێت: ئەوەی دوو دار یان چیلکەیبینی دەیخاتە نێو ئاگرەوە هەتا بسووتێ لەو شوێنەدا قسەی زبرو رەق دەکرێتو پترو زیاد دەکات، ئەوەی ببینێ داری وشك بۆ سووتاندنو

خۆشی کۆکردەوە گوناهێك ئەنجامدەدات وەك دزیو زینا یان کوشتنو هەواڵو، دەنگو باسەکەشی دەگوێزرێتەوە لای فەرمانڕەواو ئەویش بڕیاری سزادانی دەردەکات.

*هەرکەسێکیش داربسووتێنێو ئاگر بکاتەوە دوو زوبانیە بەرانبەر یەکێگ لای فەرمانڕەوا.

*دەگونجێت داری وشك بۆ یەکێك هەڵبیگرێت گوفتارێکی رەقو زبربێت یاخود بریندارکردنی ئابڕووی خەڵکی.

*ئەگەر بینی داری هەیە بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزیو بەدەستهێنانی پێداویستیو میراتی یان لەماڵێکی دابینکراوی یەکخراودا.

*ئەگەر دارەکە لەو جۆرەبوو پێویستی بەشکانو دانان لەبەر خۆردا دەکرد رزقو رۆزییەکە بەماندوبوون ئامادەی سووتانبوو بەڵگەیە لەسەر نزیکی لەفەرمانڕەواوەو ئاسانکردنی کاری قورسوگران.

*دەگونجێت داری وشك بەڵگەبێت لەسەر بەلاو نەهامەتی یاخود بەخیلی بەشتی بینراوو ئامادە، کۆمەڵە دارو چیلکەیەکی لەسەریەك هەڵچنراویش ماڵو داراییەکی جیاوازە، ، ئەگەر بێکاربێتو دەستەیەداری وشك ببینێ خزمەتی پیاوێکی رێزدار دەکات.

*کۆکردنەوەی دارو چیلکە بۆ نەخۆش چاکبوونەوەیەتی.

*هەموو دارێك لەخەودا بدرێتە پاڵ بەروبوومێ فەوتانو لەکیسچوونی ماڵو داراییەیە مرۆڤ بەدەستیدەهێنێت لەو بەروبوومەوە.

*ئەگەر داربنێت بەئاگرەوە بەڵگەیە لەسەر نزیکی لەپەروەردگارەوە یاخود منداڵەکەی دەخاتە بەردەستی مامۆستایەك پەروەردەی بکات.

*ئەگەر ئاگرەکە بەوداره گڕو بڵێسەی سەند خێرەکەی قبوڵبوەو منداڵە بچووکەکەشی قوتار دەبێتو سەردەکەوێت بەسەر دوژمنو رکەبەرەکانیدا.

*ئەگەر لەخەودا داروچیلکەی خوارد ماڵو داراییەکی حەرام دەخوات یاخود دارکاریدەکرێت لەکاتی بێداریدا.

*ئەگەر کەشتیەکی هەبوو بینی گڕدەگرێتو دەسووتێت یاخود دارەکانی دەسووتێت بەڵگەیە لەسەر نوقمبوونی کەشتیەکەی لەبێداریدا.

*بنەکۆتەرە بەڵگەیە لەسەر وەستان لەجموجووڵ ، هەروەها بنەکۆتەرە بۆ گۆشت برژاندنو پینەچێتیو

هاوچەشنەکانی بەڵگەیە لەسەر سوود وەرگرتن ئەگەر وانەبێت بەڵگەیە لەسەر ناڕێکی ژن یاخود پیشەوەر یان پەککەوتنی سوود وەرگرتن.

**دارەمەیت :** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دارەمەیت پادشایەکی مەزنە، ئەگەربینی وەك ئەوەی لەدارەمەیتێکدایە دەسەتەڵاتێك بەدەستدەهێنێت ئەگەر شایستەیبوو بەپێی ئایەتی: ﴿إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ﴾(البقرة: ٢٤٨).

*راڤەکارانی خەو دەڵێن: خاوەنی ئەم خەوە لەدوژمنەکەی دەترسێت‌و بەڵگەی قوتاربوونە لەدوژمن دوای ماوەیەك.

*ئەگەر یەکێك خەوێکی ئاوای بینی‌و کەسێکی غەریب‌و نادیاربوو دەگەڕێتەوە بۆلای.

*ئەوەی بینی لەسەر دارەمەیتێکە وەسیەتی بۆ دەکرێت یان لەشەڕو ئاژاوەدایەو سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت‌و بەهیواو ئاواتی خۆی دەگات.

(نابلسی)دەڵێت: ئەوەی ببینێ دارەمەیتێکی دەدەنێ زانیاری‌و دڵئارامی‌و ڕێزو شکۆی پێدەبەخشرێ، دارەمەیتیش لەخەودا بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارە ، یاخود بەڵگەیە لەسەر پاڵنەرو هۆکاری سەفەر.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر فەرمانڕەوای جیاکەرەوەی حەق‌و ناڕەواو زانست‌و ڕێنومایی.

**داری ساج:** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر موڵك‌و دەستەڵات یان زانا یاخود بوێژ یان ئەستێرەناس.

*بینینی ساجیسوور بەڵگەیە لەسەر نەخۆشکەوتن بە تا.

**داس:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر ڕزق‌و ڕۆزی هەواڵی ڕاست، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تەواوبوونی تەمەن.

**داشەکانی شەترەنج:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەیەکی ڕێزدار.

**داڵ( ڕەشداڵ ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: داڵ پیاوێکی بەهێزو جەنگاوەرەو کەسی نزیك‌و دوور دڵنیا نییە لێی.

*بەچکەی داڵ پیاوێکی ئازای خاوەن دەستەڵاتە.

*ئەگەر داڵی لەسەربانی ماڵەکەی یان لەگۆڕەپان‌و حەوشەکەی بەدیکرد خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر فریشتەی مردن.

* ئەگەر داڵێکی بینی کەوت بەسەریا کۆچی دواییدەکات، چونکە ئەگەر داڵ ئاژەڵێك بەنینۆکەکانی هەڵبگرێ دەیکوژێ.

* ئەگەر بینی داڵێکی گرتو بەگوێی کرد لەگەڵ فەرمانڕەوایکدا تێکەڵدەبێ.

* ئەگەر داڵێکی بینی بەنینۆکەکانی لێدا ناڕەحەتیو بەلا روودەکات خۆیو ماڵو دارایی.

* ئەگەر داڵێکی بینی لێی نزیکدەبێتەوە یاخود شتێکی دەداتێ یان دەدوێ لەگەڵی بەگوتارێك حاڵیدەبێت سوودو قازانجە.

* ئەگەر ژنێك داڵێکی لەبری منداڵێکیبوو کوڕێکی گەورەو مەزنی دەبێت، ئەگەر هەژاربوو کوڕەکە سەرباز دەبێت.

* هەروەها ئەگەر سواربوونی داڵ بۆ گەورەو سەرۆکبوو بەڵگەی تیاچوونو فەوتانەو بۆ هەژاریش بەڵگەی خێروچاکەیە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر گۆشتی داڵیخوارد خاوەنی داوایە، داڵ ئەگەر دەستەلاتدارێکی سستبوو خەڵکی دەستەلاتدار لەسەر دەستی تیادەچێت.

* ئەگەر داڵێکی بینی بەسەرداریکەوە خێرو فەڕونیعمەتی دەستگیردەبێت.

* ئەگەر بینی دەفرێ بەرێکی زاڵدەبێ بەسەر سەرجەم دوژمنەکانیدا.

* ئەگەر داڵێکی بینی لەسەر بەردێك یان دارێك یاخود شوێنێکی بەرز بەڵگەی خێرە بۆ یەکێك بیەوێت کارێك ئەنجامبداتو بەڵگەی شەڕە بۆیەکێك بترسێ لەشتێك یان لەسەفەردابێ.

* بۆ یەکێك لەسەفەردابێت بەڵگەیە لەسەرگەڕانەوەی لەسەفەردا.

* ئەگەر بینی داڵێك هەڕەشەی لێدەکات بەڵگەیە لەسەر هەڕەشەیە لەلایەن پیاوێکی گەورەوە.

* ئەگەر داڵێکی مردووی بینی بەڵگەیە لەسەر مەرگی گەورەکەی.

* ئەگەر داڵێکی بینی بەچنگ شتێکی هەڵگرت لەنێو خەڵکیدا کوڕێکی دەبێت ناوبانگدەردەکاتو ستایشدەکرێ لەشارەکەی خۆیدا.

* ئەگەر دزو قوڵبڕ داڵیان بینی پێیاندەکات.

* ئەگەر بینی داڵێك هەڵیگرتو بردی دەبێت بەکەسێکی رێزدار یان سەفەرێکی دوور ئەنجامدەدات.

* ئەگەر بینی کوشتار لەگەڵ داڵێکدا ئەنجامدەدات بەربەرەکانی لەگەڵ دەستەلاتدارێکدا دەکات.

*دالْ بۆ یەکێك لەجەنگدابێ بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا چونکە ئالاو بەیداخی پێغەمبەربوو(ﷺ).

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵو دارایییەکی زۆرو جەونگو شەڕ.

*داڵی مێینە ژنی هەڵەکارەو بەچکەکانیشی منداڵە لەزیناوە پەیدابوون.

*(دمیری)دەڵێت: ئەگەر ژنێك بینی داڵی بوە کوڕەکەی پەیوەندیکردوە بەفەرمانڕەواوە یا خزمەتیدەکات یاخود نەیاریەتی.

**داڵان (ڕاڕەو):** (نابلسی) دەڵێت: خزمەتکارێکە لەسەر دەستی ئەودا چارەسەرو گرێی کۆندەکرێتەوە.

*دەرگاوان یاخود ئەو کارو کردارەی بەهۆیەوە دەگات بەبەهەشت یان دۆزەخ یاخود کارێکە مرۆڤ دەگەیەنێت بەمەبەستو هیوا.

*دەگونجێت داڵان بەڵگەبێت لەسەر گۆڕ چونکە داڵانو ڕاڕەوی بەهەشت یان دۆزەخە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەپێ ڕۆیشتنی نەخۆش یان بژێوی بەڕێوەچوون، ڕووناکیو فراوانی بەڵگەیە لەسەر دەرەنجام باشی، تاریکیشیو زۆری پێچو پەنای بەڵگەیە لەسەر خراپی چارەنووسو دەرەنجام.

**داڵەکەرخۆرە:** (نابلسی) دەڵێت: داڵەکەخۆر ناقۆلاترین باڵندەیە کەراو ناکات، بینینی لەخەودا بەڵگەو نیشانەیە لەسەر گەلو نەتەوەیەك کەبێڕەوشتو سوودن، بینینی باڵندەی کەوتوو بەڵگەیە لەسەر گاڵتەو ڕابواردن لەگەڵ پلەوپایەی بەرزو سەرکەوتن بەسەر دوژمندا بەتایبەت ئەوەی خاوەنی بێت یا بەشێك لەو باڵندەیە.

*بینینی دەستەڵاتدارانو ئەوانەی نزیکن لێیان بۆ باڵندە لەخەودا شەڕو خراپەو غەرامەیە.

*بینینی ئەوەشی مرۆڤ چاوی پێی گەشدەبێت بەڵگەیە لەسەر هاوسەرو منداڵ، بینینی ئەوەی داڵ پێی تەنگ دەبێت بەڵگەیە لەسەر تێکەڵبوون لەگەڵ دژەکان لەعەجەم.

*بینینی باڵندەی ملشکێن بەڵگەیە لەسەر دڕندەو جانەوەری زیانبەخش.

*بینینی باڵندەی دڕندە شکۆمەندیو سوودو ڕزقو ڕۆزییە.

*بینینی ئەو باڵندەیەشی گۆشتی دەخورێت سوودو ئاسانییە.

*هەروەها بینینی ئەو باڵندەیەشی گۆشتی دەخورێت چاکەو باشەیە.

*بینینی باڵندەی نێر بەڵگەیە لەسەر نێرینەی پیاوو بەپێچەوانەشەوە.

*بینینی ئەو باڵندانەی خێرو شەڕیان تیایە دەرووی خێرە دوای نارەحەتی یا دەروە دوای تەنگ پێهەڵچنین‌و نارەحەتی.

*بینینی ئەوەی لەشەودا بەدەردەکەوێت یان بەڕۆژ بەڵگەیە لەسەر جەربەزەیی‌و سووربوون لەسەر داوا.

*بینینی ئەو باڵندانەی بەشەو دەردەکەون‌و بەڕۆژ هێوروشاراوە دەبن بەڵگەیە لەسەر خۆشاردنەوەو پارێزگاری.

*بینینی ئەو باڵندانەی شەڕێکی ڕەهان بەڵگەیە لەسەر دوژمنایەتی، هەروەها بینینی باڵندەی بەسوودو خێرداریش بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی لەترس‌و بیم‌و رزق‌و رۆزی حەلاڵ‌و پۆشاك‌و جل‌وبەرگ.

*بینینی ئەو باڵندانەی بەڕۆژ دەردەکەون‌و شەویش هێورو خەفەن بەڵگەیە لەسەر بژێوی بەهۆی ڕەنج‌و کاری جیاوازو هەمەچەشنەوەو سیخوڕی‌و خۆڕاگرتن بۆ هەواڵ‌و دەنگ‌وباس.

*بینینی ئەو باڵندانەی بێنرخن لەحاڵی بێداریدا ئەگەر لەخەودا نرخیان پەیداکرد بەڵگەیە لەسەر سوود خۆریی‌و خواردنی ماڵ بەناحەق‌و بەپێچەوانەشەوە.

*بینینی ئەو باڵندانەی باڵناگرن‌و نافڕن بەڵگەیە لەسەر پەیمان شکێنی‌و خراپەو بەپێچەوانەشەوە.

*بینینی ئەو باڵندانەی لەکاتێکی تایبەتدا بەدەردەکەون بەڵگەیە لەسەر دانانی شت لەشوێنی نابەجێ‌و ناشیاودا یا گۆڕانی دوژمن‌و هەواڵی سەیرو خۆ هەڵقورتان لەکاروبارێکدا کەپەیوەندی بەمرۆڤەوە نییە.

*بینینی باڵندەی ئاوی خەڵکی ماندو بژێوی پەیداکەر یان خوداناس‌و پاکژن ئەمەش لێکدانەوەیەکی گشتییە سەبارەت بەباڵندەکان‌و دەتوانرێت بەو پێودانگە سەرجەم باڵندەکانی دی لێك بدرێتەوە.

**داڵێکی گەورە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بۆیەکێك بەدەستی بهێنێت بەدەستهێنانی دەستەڵاتە، بۆئەوەی شایستەیەتی ئەوەی شایستەی نەبێت وتەیەکی حەق‌و ڕاستییەو لەخاوەنەکەی وەرناگیرێ.

* ئەگەر دالێکی گەورەی ببینی نیشتنەوەبەسەریەوە بەڵگەیە لەسەر برین و تالآنی لەلایەن دزو جەردەوە.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کورپیان خزمەتکارە.

**دانا:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: دانا پیاوێکی ئازادکارە.

**دانان(هۆنینەوە):** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر زانیاری یان کۆکردنەوەی ماڵ و سامان لەرێی خۆیەوە لەگەڵ خۆشەویستی و تەبایی و گوێڕایەڵی پەروەردگاردا.

**دانپیانانی مرۆڤ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دان پیانان بەبەندایەتیکردنی مرۆڤێك دژایەتیەتی ، داننان بەگوناهو سەرزەنشتی نەفس بەدەستهێنانی پلەوپایەو شکۆمەندی و تەوبەیە بەپێی فەرمایشتی پەروەردگار: ﴿قَالا رَبَّنا ظَلَمْنَا أنْفُسَنَا﴾.

* داننان بەکوشتنی مرۆڤێکدا بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی پلەوپایەو دەستەلآت یان هێمنی و ئاسایش بەپێی ئایەتی ﴿فَقَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْساً﴾.

**دانیال(سەلامی خوای لێبێت):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر (دانیال)ی ببینی بەختو چارەیەکی بەرین و فراوانی دەستگیر دەبێت و فێری زانستی لێکدانەوەی خەو دەبێت و زاڵدەبێت بەسەر کەسێکی ستەمکاردا دوای ئەوەی ئێش و ئازاری پێدەگەیەنێ، هەروەها وتراوە: دەبێت بەمیرو شا.

* دەگێڕنەوە(ئەبا عەبدوڵلآ)ی (باهلی) لەخەودا بینیوویەتی (دانیال)ی هەڵگرتووە لەسەرشانی و پاشان لەسەر دیوارێك دایدەنێ و دەیژێنێتەوەو گفتوگۆی لەگەڵدادەکات و پێی دەڵێت: مژدەبێت تۆ چوویتە ریزی میراتگرانی پێغەمبەران و بوویت بەیەکێك لەراڤەکارانی خەو.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بەدیکرد دەبێت بەپێشەواو ئیمام لەلێکدانەوەی خەودا، هەروەها گوتراوە: دەبێت بەپێشەواو وەزیرو زانیاری بەدەستدەهێنێت و لەلای پادشاو فەرمانڕەوایەکی ستەمکارەوە زیانی پێدەگات ، پاشان زاڵدەبێت بەسەریا.

* ئەگەر بینی (دانیال) پێغەمبەری هەڵگرتوە بەسەرشانیەو لەسەر دیوارێك دایدەنیّ و گفتوگۆی لەگەڵدا دەکات یان مژدەی پێدەدات یاخود کەوچکیّ هەنگویندەکات بەدەمیەوە بەدەستی خۆی و دەبێت بەپێشەوایەك لەراڤەکارانی خەو.

**دانیشتن:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نەتوانین و دۆڕاندن، دانیشتنی ژن خاوی و سستییە لەهاوسەرگیریدا.

**دانیشتوانی ئەوروپا:** (نابلسی) دەڵێت: بینیان بەڵگەیە لەسەر هەڵهاتن و قوتاربوون.

**داوا(خواز):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی داوای شتێکدەکات دەگات بەداواوخوازی خۆی بەپێی وتەی: "ئەوەی داواخوازی شتێکبێت بەدەستیدەهێنێت ئەگەر هەمووشی نەبێت هەرکەمێك بەدەستدەهێنی".

*ئەگەر بینی کەسێك بەدوایدا دەگەڕێ غەم و پەژارەی دێت بەسەردا.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا چارەنووسێکی پێوەلکاوە ، ئەگەر بینی نەیارەکەی چوو بەدوایدا لەخەودا دەمرێت.

*دەگونجێت داواکردن بەڵگەبێت لەسەرئەوەی مرۆڤ پێی شکۆمەند دەبێ لەزانیاری و کردار یان ماڵ و دارایی، داوتاش بەڵگەیە لەسەر داواکراو ئەگەر هەڵهاتوونەبێت، ئەوکاتە دڵنیادەبێ لەترس و بیم.

*ئەگەر مرۆڤێکی ناشیرینی بینی بەدوایدا دەگەڕێ ، ڕووداوێکە خەشم و قینی لیدەبێتەوە، ئەگەر پێگەیشت ترس و بیم ڕووی تێدەکات.

**داواکردن لەزانایان یاخود فەرمانڕەوایان :** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەسەر شێوەی بەخشین و خەڵاتبوو بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی کارەسات پێویستی بەو کەسانە دەبێ تێدا، داواکردن لەدەوڵەمەند بۆ هەژار ئاگرە دەیسووتێنێ.

**داود(سەلامی خوای لێبێت):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر (داود) پێغەمبەری بینی دەستەڵات و هێز و پلەوپایە بەدەستدەهێنێت.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بەدیکرد هێز و دەستەڵات بەدەستدەهێنێت ، پاشان دەکەوێتە کاروکردارێکی هەڵەوەو پاشگەز دەبێتەوە لێی و دوورەپەرێز دەبێت ، پاشان فەرمانڕەوایەکی ستەمکار دێتە ڕێی و دواتر خوداوەند قوتاریدەکات لێی و زاڵ و سەرکەوتوویدەکات بەسەریاو موڵك و دەستەڵات و شکۆمەندی پێدەبەخشرێ.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی (داود) ببینێ لەوشارەدا پادشاو فەرمانڕەوایەتی دادپەروەر دەبینێ یاخود سەرکردەیەکی بەڕێز یا دادوەرێکی

راستگۆو دادگۆ، ئەگەر سەرۆکی ئەو شارە ستەمکاربوو پەروەردگار بەسەرۆك و بەرپرسێکی دادپەروەر دەیگۆڕێ، ئەگەر دادوەرێکی ستەمکاربوو خوداوەند بەدادوەرێکی دادپەروەر دەیگۆڕێت ئەگەر شیاوی دادگابوو پێیدەبەخشرێ.

* بینینی(داود) (سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەیەلەسەر پۆستو دەستەڵات.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+تاقیکردنەوەی پیاوو ژن.

+غەمو پەژارەخواردن لەرێگەی ژنانەوە.

+قورئانخوێندنو زیکرو یادی خوا.

+تەوبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا.

+چەكو جبەخانەو ئەوەی لەئاسن دروستدەکرێت.

* ئەگەر خەوبینەر چەكو جبەخانەو ئەوەی لەئاسن دروستدەکرێت پیشەیبوو سوودو قازانجێکی بێشومارو زۆر دەکات، دەگونجێت بەلاو نەهامەتی لەلا سووكو ئاسانبێت.

* هەروەها بینینی بۆ (داود) (سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەیە لەسەر دەرەنجامو چارەنووس چاکبێت.

* ئەگەر بینی چوەتەسەر شێوەی (داود) یاخود جلوبەرگێکی ئەوی پۆشیوە ئەگەر شایستەبوو دەبێت بەدادوەر یان فەرمانڕەوا، ئەگەر شایستە نەبێتو بژێویو پیشەکەی لەگەڵ ئاسندابێت سوودو قازانجدەکات.

* ئەگەر پیاوچاك بێت مژدەی بەزیادبوونی خێر لەگەڵ زیانو گرانو ملکەچیو غەمباری پێدەدرێت، بەلاّم ئەگەر زانایەکی ستەمکاربێتو بینینی غەمو پەژارەی دەداتێ یاخود هەڕەشەی لێدەکات.

**داوی راوچی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی چۆلەکەیەکی راوکرد بەدارێك پیاوێکی خراپەکاری بەدئاینەو پلاندەگێڕێ لەپیاوێکی مەزن، چونکە دار دووڕوویيو پلانو فێڵەو چۆلەکەش پیاوە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ژنێك بینی داوێك دەنێتەوە هەرکات باڵندەی تێدکەوت دەفڕیو هەڵدێ، ئەو ژنە خوازیاری دووگیانییە لەمێردەکەیو لەسەر حاڵو بارێك ناوەستێ.

**داوێنپیسی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بێباوەڕی بەپێی ئایەتی: ﴿وَلاَ يَلِدُوا الاَّ فَاجِراً كَفَّارًا ﴾ (نوح: **٢٧**).

* داوێنپیسی ژنی دووگیان قوتاربوونیەتيو هی کوڕیش هەروایە.

**دایك:** ئەگەر لەخەودا بینی لەدایکبوو و دایکی نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر مردنی چونکە مردوو کفنی تێوە دەپێچرێ وەك چۆن منداڵ قومات دەکرێت ، ئەگەر دایکیشی لەشساغو هەژاربوو خودا رزقو رۆزی دەدات، ئەگەر دەوڵەمەندبوو رزقو بژێوی تووشی گرفتو تەنگەبەری دێت.

**دایەن:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی دایەن بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی شتی پەنهانو شاراوە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر زیانو مەرگی نەخۆشو وتنی ئامۆژگاری.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر رووکردنە بەلاو نەهامەتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەرکردنی ئاگرپەرستو خاڵیکردنەوەی غەمو پەژارە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەڵگیرساندنی ئاژاوەو شەرو پێکدادان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر غەرامە.



**ددان :** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ددان خانەوادەی پیاوە ، ددانەکانی سەرەوە پیاوانی خانەوادەن ، هی خوارەوەش ژنانی ماڵە ، کەڵبە گەورەی ماڵەو ددانەکانی پێشەوەی لای راست باوکەو هی چەپیش مامە، ئەگەر وانەبێت دووبراو کوڕن ، ئەگەر وانەبێت دوو هاوڕێی یەکن ، چوار ددانی ناوەڕاست ئامۆزایە ، ددانی پێشەوە خاڵو پوورەو ئەوەی جێگەیان دەگرێتەوە، خرێکانیش باپیرو وەچەی بچووکن، ددانی برندەی لای راست دایکەو هی لای چەپیش پوورە ، ئەگەر وانەبێت دوو خوشكو کچ یان ئەوەی جێیان دەگرێتەوە،چوار ددانی خوارەوەش کچانی مامو پوورە ، کەڵبەی ژێرەوەش خاتوونی ماڵی خۆیەتی، ددانەکانی خوارەوە کچە خاڵو پوورە، خرێکانی خوارەوەش کەسانی دوورن لەکەسی ژنو پیاو، جموجووڵی هەندێك لەددانەکانیش بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی، کەوتنو نەمانیشی فەوتانو مردنە یان ونبوونێکە کەگەڕانەوەی لەدوا نییە ، ئەگەر تووشی ژانو ئێش ببێت بەرلەوەی ونیبکات دەگەڕێتەوە، کلۆربوونیشی بەڵگەیە لەسەر بەلایەك تووشی ئەوانە دەبێت کەلەژێر بەیداخی ئەودانو جیرەی ددانیش بەڵگەو نیشانەی مشتومڕە لەنێوان خانەوادەی ماڵەکەی.

* ئەگەر بینی ددانەكانی زەرد هەڵگەڕاوە خەوش و عەیبە روو لەخانەوادەو كەس وكاری دەكات.
* رزین و بۆگەنكردنی ددانی ناڕێكی ستایشی خانەوادەیە .
* لاوازی و بێهێزی ددان لاوازی حاڵ و باری خانەوادەكەیەتی.
* پاككردنەوەی ددان لەپەڵغ و زەردی بەڵگەیە لەسەر بەخشینی ماڵ و رەواندنەوەی غەم و پەژارە لەسەریان.
* بینینی ددان و درێژی و جوانی هێزێكی زیادەو ماڵ و دەستەڵاتە بۆ خانەوادەی.
* ئەگەر ببینێ وەك ئەوەی جێگیربوە لەگەڵ ددانەكانی پێشەوەدا ئەندامانی خانەوادەكەی زیاد دەكەن.
* ئەگەر ببینێ چەسپاوو جێگرە لەگەڵیدا زیانی پێدەگەیەنێ ئەوەی زیاد دەكات لەخانەوادەكەی دەبێت بەمایەی عەیب و عار بۆی.
* ئەگەر بینی ددانەكانی بریەوە بەڵگەیە لەسەر بچڕانی پەیوەندی خزمایەتی یان بەزۆر پارەو سامانی پێدەبەخشن.
* ئەگەر بینی ددانەكانی فڕێدەدات كاروباری خانەوادەكەی تێكدەچێت بەقسەیەك كەخۆی دەریدەبڕێت.

* ئەگەر بینی ددانەكانی وەك ئاڵتوون وایە ئەگەر زانست پەروەرو قسەزان بێت خەوەكەی باشە وەگەرنا باش نییە چونكە بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی و ئاگر كەوتنەوە.
* ئەگەر بینی ددانەكانی لەزیوە بەڵگەیە لەسەر زەرەرو زیان لەماڵدا.
* ئەگەر بینی ددانەكانی لەشووشە یان دارە بەڵگەیە لەسەر مردن.
* ئەگەر بینی ددانەكانی پێشەوەی كەوتن و لەجێی ددانی دی هاتن بەڵگەیە لەسەر گۆڕانی كاروبارەكانی.
* هەروەها دەڵێن:
+ئەوەی ددانەكانی سەرەوەری بكەوێتە نێو دەستی ماڵ و دارایەك رووی تێدەكات.
+ئەگەر بكەوێتە ئامێزو كۆشی كوڕی دەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ﴾.
+ئەگەر كەوتە سەر زەوی ئەوا مەرگ رووی تێدەكات.
+ئەگەر بینی ددانی كەوتووی خستە نێو دەستی و نەیشاردەوە یەكێكیتر لەبری ئەو سوودمەند دەبێت لەبەزەیی و ئامۆژگاری.

+سەبارەت بەهەموو ئەندامەکانی دیکەش وایە ، ئەگەر بەلاو نەهامەتیەك رووی تێکرد ونی نەکردو داینەپۆشی.

*ئەگەر بینی لەدلّیا ددان رواوە بەلّگەیە لەسەر مردنی.

*هەروەها دەلّێن: ددان کەوتن کۆسپو رێگرە لەبەرانبەر ئەوەدا کەدەیەوێت.

*بەلّگەی دادی دیوانە.

*ئەگەر بینی سەرجەم ددانەکانی کەوتن‌و لەکۆشیا یان قۆلّیدا کۆیکردەوە تەمەن درێژ دەبێت تا سەرجەم ددانەکانی دەکەون‌و وەچەی زیاد دەکات.

*ئەگەر بینی سەرجەم ددانەکانی کەوتن‌و لەبەر چاوی ونبوون خانەوادەو خاوخێزانی دەمرن بەر لەخۆی یاخود دەگونجێت مردنی هاوتەمەنەکانی بێت لەخزم‌و خوێشی.

*ئەگەر بینی خەلّکی جیڕەجیڕ دەکەن بەددانەکانیان یاخود ئامۆژگاریدەکەن ئەوا دەتوانێت ئامۆژگاری خەلّکی بدات بەلاّم نایکات.

*هەروەها دەلّێن: دەگونجێت دەم‌و زار وەك مالّ‌و لانە وابێت، ددانیش وەك دانیشتوانە ئەوەی جێنشنیەتی لەلای راستی نێرینەکانەو لای چەپیش مێینەیە لەسەرجەم خەلّکیدا.

*هەروەها دەلّێن: ئەگەر یەکێك بینی ددانەکانی شکان هێدی هێدی قەرزەکانی دەداتەوە.

*ئەگەر ددانەکانی بێێش‌و ئازار کەوتن بەلّگەیە لەسەر بەتالّبوونەوەی کردارەکانی.

*ئەگەر بینی ددانەکانی بەژان‌و ئێشەوە کەوتن بەلّگەیە لەسەر ونبوونی شتێك لەمالّەکەی خۆیدا.

*ئەگەر ددانەکانی پێشەوەی کەوتن رێگە نادرێت مرۆڤ کارێك ئەنجامبدات بەوتەو لێدوان، ئەگەر ژان‌و ئازاری چەشت یان خوێن‌و گۆشتی لێهاتنە دەرەوە بەتالّدەبێتەوە یان ئەوکارەی خوازیارییبوە تێکدەچێت.

*سەبارەت بەلەشساغ‌و مرۆڤی ئازادو گەشتیار ئەگەر سەرجەم ددانەکانیان کەوت بەلّگەیە لەسەر نەخۆشیەکی درێژخایەن‌و کەوتنە هەلاکەت بێئەوەی بمرن.

*ئەگەر سەرجەم ددانەکانیان کەوت بەلّگەیە لەسەر قوتاربوونیان لەنەخۆشی.

*سەبارەت بەبازرگانە گەشتیارو موسافیرەکانیش ددانکەوتن بەلّگەونیشانەی سووکی کارەکانیانە

بەتایبەت ئەگەر بینی ئەو ددانانە دەجوولێن.

*ئەگەر بینی هەندێك لەددانەكانی درێژو زۆر گەورەبوە بەڵگەیە لەسەر مشتومڕو دەمە دەمە لەماڵەوە.

*ئەوەی ددانەكانی بەڕەشیو كلۆریو خوراو لاربێت ببینێت دەكەوێت لەبەلاو نەهامەتی قوتار دەبێت، خۆئەگەر ببینیێ ددانەكانی دەكەونو خۆشی بەدەستی هەڵیاندەگرێت یان بەڕیشی یاخود لەكۆشیا بەڵگەیە لەسەر بچڕانو دوایی هاتنی وەچەخستنەوە، ئەگەر منداڵیشی ببیێ نامێنیێو پەروەردە نابیێ.

*دەگێڕنەوەپیاوێك دەبینیێ لەخەودا سەرجەم ددانەكانی دەكەون غەمو پەژارەیەكی زۆر دەخواتو خەوەكەی بۆ خەولێكدەرەوەیەك دەگێڕێتەوە ، ئەویش دەڵێت: سەرجەم ددانەكانت بەر لەخۆت دەمرن ، پاشان ئەو لێكدانەوەیەش وەك خۆی دێتە دی.

*یەكێكی دی لەخەودا دەبینیێ سیێ ددانی خستە نێو چنگیو دەستی نوقاند ، پاشان بۆیان لێكدایەوە گوایە درهەمو نیوێكی دۆزیوەتەوە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ببینیێ هەندێك لەددانەكانی كلۆربوون یان رزیون خاوەنەكەی بەلاو نەهامەتی دێت بەسەریاو سوودی لێوەر ناگرێت.

*ددانی لای راست بەڵگەیە لەسەر بەتەمەنەكان لەپیاوو ژن.

*ددانی لای چەپ بەڵگەیە لەسەر رووداوەكان.

*ددانەكانی پێشەوە بەڵگەیە لەسەر منداڵ.

*كەڵبەكان بەڵگەیە لەسەر نیوەی ئەوان.

*ددانی هارەڕ بەڵگەیە لەسەر بەتەمەنەكان.

*ئەگەر مرۆڤ بینی هەندێك لەددانەكانی كەوتن بەڵگەیە لەسەر تیاچوونی ئەوەی ددانەكەی كەوتووە.

*ددانەكانیش بەڵگەن لەسەر كاروباری مرۆڤ.

*خرێكان بەڵگەن لەسەر كاروباری نهێنیو شاراوە.

*كەڵبەكانیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نهێنیو پەنهانەو دیار نییە لای زوربەی خەڵكی.

*ئەگەر بینی كەڵبەكانی درزی بردوە كوڕی دەمرێت .

*ددانیش نیشانەو بەڵگەیە لەسەر خزمو خوێشو خەڵكی دوور، ئەوەی

لەدوای چاوەوە دێت پیاوەو ئەوەی دوای کولمیش ژن.

*ئەوەی چارەسەری هەندێك لەددانەکانی بکاتو بەوەی دەری بهێنێ خراپ نییەو بەلگەیە لەسەر غەرامکردنو لێسەندنی مالّو دارایی، یاخود هەلکەندنی هەندێك لەخزمەکانی لەشوێنی خۆیان.

*ئەگەر بینی لەو شوێنەی ددانەکەی هەلدەکێشن کرمێکی ورد یان دوو کرمو زیاتر بێتەدەرەوە منالەکانی دەچنە شوێنیو بەرِێو جێی ئەودا دەرِۆن.

*ئەوەی ببینێ ددانەکانی بۆنێکی ناخۆشیان هەیەو بۆگەنیان کردوە ، یاخود لەوبابەتە باسو ستایشی ناقۆلا دەبێت.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر مشتومری خزمەکانی لەسەری یاخود جموجوولێك بکەوێتە نێو خانەوادەکەی.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر مشتومرو بەربەرەکانی.

*ئەگەر ددانەکانی درێژبوونو چوون یەك نەبوون ناکۆکی دەکەوێتە نێوان خۆیو خانەوادەکەیو هەرگیز تەبا نابێت لەگەلّیان.

*ئەگەر بینی ددانەکانی کەوتن بەلگەیە لەسەر نەمانی جێگەوشوێن یاخود هەژارییو کورتی رزقو رۆزییو بژێوی یان بەئاوارەیی دەمرێتو دوور لەخانەوادەی، یان تەمەنی درێژ دەبێتو مالّو دارایی زیاد دەکات بەئەندازەی خوێنی ددانەکانی.

*ئەگەر بینی سەرجەم ددانەکانی هەلکێشرانو لەشوێنو جێگەیەك لەسەر زەوی داپۆشران خانەوادەکەی بەر لەخۆی دەمرنو بەخاکیان دەسپێرێ.

*ددان هەلکێشان بەزمان قسەو وتەیە دەیکاتو کاروباری خانەوادەی خۆی پێ دەشێوێنی.

*هەروەها دەلێن: هەلکێشانی بەلگەیە لەسەر دیاریدانی رووداوی مەترسیدار.

*ئەگەر بینی ددانەکانی جوولان قەرزەکەی بەهێواشی دەبژێرێتەوە.

*ئەوەی ببینێ ددانەکانی خورراوو کلۆربوون خانەوادەکەی رسواو ملکەچیدەکەن لەکاتی پێویستی بوونی بەوان.

*ئەوەی ببینێ لەشوێنی خۆی لادەچێت ددانی سەرەوە بۆ خوارەوەو بەپێچەوانەوە بەلگەیە لەسەر زالّبوونو زیادەرەوی ژنانی ژێر سایەی مالەکەی بەسەر پیاواندا و رووداني ناتەواوی لەنێوانیاندا یاخود کەمو کورییو ناتەواوی لەمالّو داراییاندا.

*ئەوەی ددانی بئاژنێ بەڵگەیە لەسەر پەرتەوازەبوونی خانەوادەکەی و ڕوودانی ناتەواوی لەنێوانیاندا یاخود کەم و کورتی لەماڵ و داراییدابەڵام ئەگەر گۆشت لەنێوان ددانەکانیدا گیربوو غەیبەتی کۆمەڵێکی کردووەو بەزوبانی ئازاری داون.
*هەروەها دەڵێن: ددان بەڵگەیە لەسەر دانە دانەی گەوهەربەندی ژنان.
*ددان بەڵگەیە لەسەر:
+ئاش.
+ریزەکانی سوپا لای ڕاستی ریزی ڕاستەو لای چەپیشی بەهەمان شێوەیەو ناوەڕاستیشی دڵو نێوجەرگەکەیەتی.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: دەرهێنانی ددان لەخەودا بچڕانی رایەڵەو پەیوەندی منالی نێرینەیە، ئەوەی ددان دەربهێنێ گوناهیکردوە بەبچڕانی پەیوەندی خزمایەتی.
*ددانیش لەگیرفان یا دەستدا زیادبوونی پەیوەندی خۆشەویستی و دۆستانەیە یا منال زۆربوونە.
*ئەوەی ببینێ ددانێکی بەبێ ئازار دەرهاتوەو پیاوێکی خزمی زیندانی بێت ئازاد دەکرێت.

*لاوازی ددانیش بەڵگەیە لەسەر حاڵی خانەوادە ، ئەوەی ڕەشیی و کەم و کورتی لەشکان و درز بردن لەددانەکانیدا ببینێ غەم و پەژارە ڕوودەکاتە خزمەکانی.
*ئەوەی ببینێ ددانەکانی خوارەوە درزیبردو ڕزان هەندێك لەوانە تووشی بەلا دەبن.
*خرێکان لەخەودا سەردارو ریش سپی نەتەوەیە.
*چوار ددانی ژیری و ئاقڵیش شوێنکەوتەکانن ، ددانی ناوەڕاستیش لەگەڵ چوار ددانی نێوان کەڵبەو بڕندە ئەو ماڵ و داراییەیە کەخۆی پێی دەڕازێنێتەوە یان منالی نێرینەیە ، زەردی یان ڕەشی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گۆڕانی حاڵی ئەوەی خەوی پێوەبینراوە، کێشانی هەندێکیشی بەڵگەیە لەسەر لەدەستدانی هەندێك لەو کەس و کارانەی لێیدواین.
*هەروەها هەڵکێشانی ددان بەڵگەو نیشانەیە لەسەر گەڕانەوەی ئاوارە یان مەرگی کەسێکی ئازیزو خۆشەویست.
*ئەگەر ددانەکانی پادشاو سەرۆکبوو بە ئاسن یان مس بەڵگەیە لەسەر توندی و بەهێزی سەربازەکانی ،

ئەگەرهاتوو ددانەکانی لەدەستدا مولّک‌و دەستەلاّتی لەدەستدەدات.

*دەگونجێت بەلّگەو نیشانەبێت لەسەر پوچەلّبوونی سوودو قازانجی لەکشتوکالّ.

*دەگونجێت نەزۆک بێت‌و خوداوەند کوڕی پێنەدات یان هەژار بکەوێت دوای دەولّەمەندی یاخود سوودو قازانجی مالّ‌و ئاژەلّ‌و ئاشی نەمێنێ گەرچی هەندێك پارەی پاشەکەوت کردبێت بۆ کاتی سوود لێوەرگرتن بەلاّم حالّی دەشێوێ‌و تێکدەچێت‌و زەرەردەکات‌و دەگونجێت بمرێت‌و رزق‌و رۆزی دوایی پێبێت.

*ئەگەر بەدەستی خۆی ددانەکانی دەرهێنا لەمالّ‌و دارایدا بەخراپی هەلّسوکەوت دەکات یان لەگەلّ خانەوادەکەیدا بەخراپی مامەلّە دەکات، یا کردارێکی نابەجێ ئەنجامدەدات‌و پاشان لێی پاشگەز دەبێتەوە، یاخود سوودو قازانج دەکات لەقەرزێکدا کەدەیدات، پاشان دەگەڕێتەوە بۆی‌و خراپ دەشکێتەوە بەسەریا، ئەمەش لەکاتێکدا گەر لەبەر چاوبێت لەخەوەکەدا، ئەگەر یەکێك پێی راگەیاند بەلّگەیە لەسەر پێویستی بوونی بەرەهن‌و فرۆشتن لەوەی خۆی پێ دەردەخات.

*ئەوەی لەخەودا ددانێك دەربهێنێ‌و بەبێداری ئازاری پێبگات بەلّگەیە لەسەر چاودێریکردنی بۆئەوەی ئەشکەنجەو ئازاری دەدات‌و رەوانەوەیەتی لەسەری.

*دەگونجێت بەلّگەبێت لەسەر رەوانەوەی ناسۆری‌و ناخۆشی لەداواکارێکی حالّ پەشێو.

*رووانەوەی ددان لەشوێن‌و جێی ددانی هەلّکێشراو بەلّگەیە لەسەر قەرەبوو و سوود وەرگرتن دوای زیان، ئەگەر لەشوێنی ددانەکانی ددانی زیوین یا ئالّتوونی دەرهات بەلّگەیە لەسەر تیاچوونی مالّ‌و دارایی یان پێویستی بەتونکردنی ددانەکانی دەبێت بەهۆی نەخۆشی‌و رووداوێکی کتوپڕەوە.

*بینینی چاوو گوێ‌و ددانی زیادە بەلّگەیە لەسەر لەدەستدانی یاخود بەهاو نرخی لەئایندا بەزیادەو ناتەواوی دەستنیشان دەکرێت بەپێی ئایەتی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ والعَيْنِ بِالعَيْنِ ...﴾ (المائدة).

*دەگونجێت ددان بەلّگەبێت لەسەر سالّ یان وەنەوزو، ئەوەی ببینێ وەنەوز دەیگرێ هەلّە رووی تێدەکات یاخود خەو دێت بەسەریا، دەگونجێت

پێشوازی لەساڵێکی پیرۆز بکات یا پێشوازی لەساڵێکی خۆشنود بکات‌و دەستی پێوە بگرێ.

**ددانکەوتن**:(نابلسی)دەڵێت: ددان کەوتنی مرۆڤ لەخەودا تەمەندرێژیەتی بەدەر لەهاوتەمەنەکانی.

*ئەگەر بینی سەرجەم ددانەکانی کەوتن‌و خستییە کۆشیەوە تەمەنێکی درێژبەسەر دەبات‌و تاسەرجەم‌و ددانەکانی دەکەون‌و ژمارەی خانەوادەکەی زۆر دەبێت.

*ئەگەر بینی سەرجەم ددانەکانی کەوتن‌و لەبەرچاوی ونبوون خانەوادەکەی بەرلەخۆی دەمرێت. دەگونجێت مەرگی هاوتەمەنەکانی بێت یان نەخۆشکەوتنی خانەوادەکەی بێت.

*ئەگەر بینی هەندێك لەددانەکانی لەدەستدا یەکێك لەخزمەکانی غەریب دەکەوێت ئەگەر بەدەستی هێنایەوە دەگەڕێتەوە.

*ئەگەر بینی ددانەکانی سەرەوەی کەوتە نێو دەستی ماڵ‌و سامانێك بەدەستدەهێنێت ، ئەگەر کەوتە نێو کۆشی کوڕێکی نێرینەیە، ئەگەر کەوتەسەرزەوی بەلاو نەهامەتی مەرگە.

*ئەگەر بینی ددانەکانی خوارەوەی کەوتن غەم‌و پەژارەو ئێش‌و ئازار رووی تێدەکات.

*ئەگەر قەرزاربوو بینی ددانەکانی کەوتن لەخەودا بەڵگەیە لەسەرئەوەی قەرزەکەی دەداتەوە، ئەگەر بینی یەك ددانی کەوت یەك پیاو قەرزەکەی دەداتەوە یان بەیەکجار قەرزی بۆ دەدەنەوە، ئەگەر چەن ددانێکی بکەوێت هەندێك لەقەرزەکانی دەداتەوە یاخود یەکێکیان دەداتەوە.

*ئەگەر بەبێ ژان‌و ئێش ددانەکانی کەوتن بەڵگەیە لەسەرکردارەکانی کەبەتاڵدەبێتەوە.

*ئەگەر بەئێش‌و ژانەوە ددانەکانی کەوتن بەڵگەیە لەسەر رۆیشتنی شتێك لەماڵەکەیدا.

*ئەگەر ددانەکانی پێشەوەکەوتن‌و ئازاری هەبوو یاخود خوێنی لێهات یان گۆشتی لێبووەوە ئەوکارەی خوازیاریبوە پووچ‌و بەتاڵیدەکاتەوە.

*ئەگەر بەبێ ئێش‌و ئازارکەوتن خاوەنیەتی تیادەچێت.

*ئەگەر سەرجەم ددانەکانی کەوتن سەرجەم ئەوانەی لەنێو ماڵەکەیدان تیادەچن لەگەڵ هاوەڵ‌و موسافیران‌و

بەلگەیەلەسەر نەخۆشییەکی درێژخایەن بەبێئەوەی بمرن.

*بۆکەسانی گەشتیارو سەفەرکار بەلگەیە لەسەر ئاسانی باریان.

*ئەگەر بینی ددانەکانی دەکەوێتو خستییە نێودەستی یاخود ریشی یا کۆشی بەلگەیە لەسەر پچڕانی وەچەو مندالنەبوونی.

*هەروەها دەلێن: ئەوەی کەوتنی ددانەکانی ببینێ بەلگەیە لەسەر زیان گەیاندن بەهەندێك لەهاوەلەکانی.

*ئەگەر بینی ددانەکانی دەکەوێتە نێو دەستی یان نێو جلەکانی کوڕ یان خوشكو برای دەبێت.

*ئەگەر بینی سەرجەم ددانەکانی کەوتنە نێودەستی وەچەو خانەوادەکەی زیاد دەکەن.

*کەوتنی یەك ددان ئەگەر بۆ چارەسەرنەبوو گرتی بەدەستەوە یان لەنێو جلەکانیدابوو ئەگەر هاوسەرەکەی دووگیانبوو کوریدەبێت، وەگەرنا پەیوەندی لەگەڵ براکەی یان کەسێکی نزیکی باشدەکاتو ئەگەر خوێنی تیانەبوو رایەلەی خزمایەتی دەبچڕێ مەگەر قەرزاربێت داوای لێدەکەنەوەو هەولدەدات بیداتەوە.

*هەروەها دەلێن: ددانکەوتن بەلگەیە لەسەر رێگرێك رێگەی لێدەگرێو لەبەردەم خوازەکانیدا دەوەستێ.

*هەروەها دەلێن: بەلگەیە لەسەر قەرزدانەوە ئەگەر هەلێگرتەوە دەگونجێت قسەی هەلەبکاتو پاشگەزبێتەوە لێی، پاشان بیشارێتەوە.

*دەگونجێت ددانکەوتن بەلگەبێت بۆ تێکۆشەران لەسەر بەردەوامبوون لەسەر رۆژوو.

*ئەگەر بینی ددانەکانی کەوتنو نەیتوانی نانبخوات هەژار دەکەوێت، ئەگەر بینی کەوتە نێو دەستی بەبێئەوەی ئێشو ئازاری هەبێت ئەوە درهەمە بەپێی ژمارەیان.

*ئەگەر بینی ددانەکانی کەوتنە نێو ئەلقەیەك یەك بەیەك دەریهێنا بەردی نێوبیرەکەی دانە دانە دەکەوێت.

*هەروها دەلێن: ئەوەی ددانەکانی بکەوێت بیستو نۆ سالْ لەتەمەنی ماوە یاخود سی سالْ، هەروەها دەلێن: دوای سی رۆژ دەمرێ یاخود سی دینار غەرامە دەکرێ، هەروەها دەلێن: ئەگەر بیری ئاوی هەبوو دەتەپێ.

*هەروەها دەلێن: بەسەختی نەخۆشدەکەوێتو مالْو سامانەکەی

لەخەرجیدا بەسەردەچێت پاشان ماڵو سامانێکیتری دەستگیردەبێت.

## د ر

**درزوقلیش**: (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر کەموکوڕی یان ناتەواوییەك. دەگونجێت درزوقڵیش بەڵگەبێت لەسەر دوورکەوتنەوەی غەریبو ئاشتبوونەوە لەگەڵ ئەوەی نێوانیان لەگەڵدانەماوە.

**درزو قلیشکردنه شتێك: (شقلشکانی)**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جیاوازی یان هاوسەری کچ.

**درکاندن( باسکردن )**: (نابلسی)دەڵێت: درکاندنی باسێك کەدەبێت پەنهانو شاراوەبێت بەڵگەیە لەسەر ماڵو سامان بەفیڕۆدان، یان دانایی وتن بەکەسانێك شایستە نەبن پێی، ئەگەر لەخەودا باسی نیعمەتەکانی خودایکرد بەڵگەیە لەسەر سوپاسگوزاری بۆخوداو شاییو ئاهەنگگێڕان لەسەرئەوەی پێیبەخشیوە.

**دروشم**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە کاروباری خەڵکی سووکو بەرز دەگرێتەدەستو بەیەکەوە ئاشنایاندەکاتو سوود دەگەیەنێتو خاوەن پلەوپایەیە.

**درۆ**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: درۆ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەخەوبینەر ژێری نییە بەتایبەت کەدرۆدەکات بەدەم خوداوە بەپێی ئایەتی: ﴿يَفْتَرُونَ عَلَى اللهِ الكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ (المائدة: ١٠٣).

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گەواهیدانی درۆو درۆکردن بەدەم کەسێکەوە یان قوتارنەبوون بەپێی ئایەتی: ﴿ انَّ الذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللهِ الكَذِبَ لاَيُفلِحُونَ﴾ (النحل:١١٦).

*دەگونجێت درۆکردن بەڵگەبێت لەسەر وڕێنە لەقسەکردندا.

*ئەگەر کەسێك گوێبیستی قسەکانیبوو بەناوبانگبوو هەڵەی زیاترە لەڕاستی.

**درەختی ئەبەنووس**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەخەودا ژنێکی هندی دەوڵەمەندە یان پیاوێکی رەقی دەوڵەمەندە.

**درەختێك لەنێو ملدا بڕوێت**: (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر چارەسەر لەنەخۆشیو گوناهو تاوان ئەنجامدانو بەرزکردنەوەی قورسایی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئارامگرتن لەسەر ناڕەحەتیو دۆزینەوەی پشوو.

* درەختــی رواوی نێــو لم بەرپرســی کاروبارەکانــەو ســەر تیپــی ســوپایەو کاروبارو بەرژەوەندی خەڵکی دەپارێزێ وەك پۆلیس.

**درهــەم**[1] **( پــارە )** : (ئــیبن ســیرین) دەڵێت: درهەمی چاكو بـاش زانیـاریو بەجێهێنانی پێداویستیو نوێژە.

* درهــەمی پرشــنگدار دنیایــە بۆئــەوەی خــەون دەبینــێ ، مامەڵــە پێکردنــی ئەمەکداریو پاراستنی ئەمانەتە.

* ئەگەر ئـەو پیـاوەی درهـەم دەبینێت هاوســەرەکەی دووگیــانبوو منــداڵێکی باشیدەبێت.

* ئەگــەر درهــەمی زۆری بەدەســتیهێنا خێرێکی زۆری دەستیگردەبێت لەگـەڵ شادیو خۆشیدا.

* ئەگــەر لەخــەودا بینــی قــەرزی لای یەکێکە بەدرهەم گەواهیدانێکی حـەقو راستی بەسـەرەوە هەیـە، ئەگـەر داوای لێکــرد داوای گــەواهیو شــەهادەکەی لێدەکات، ئەگەر گەڕاندیەوە گەواهیدانە بەحـەقو درو...تی، ئەگـەر بەشـکاویو قەڵی گەڕاندیەوە ماڵو سامانە، ئەگـەر درهـەمێکی باشــی ونکــرد ئامۆژگــاری کەسێکی نەزاندەکات بەڵام واژوویـەتیو ناپاکییە لەبژێویو ڕۆچوونە لـەگوناهی گەورەدا.

* ئەو درهەمەی هـیچ نـەخشونیگارێکی تیـا نییـە قـسەو وتەیەکـە پارێزگـاریو خواناســی تیــا رەچــاونەکراوە، ئــەو درهەمەشی وێنـەی تیایـە بیدعـەکاریو ناپاکییە لەئایندا.

* درهــەمی پارچــە پارچــەکراو شــەڕو ئاژاوەیەکە هەرگیز نابڕێتـەوەو کۆتـایی پێنایەت.

* هــەروەها دەڵــێن: وەرگرتنــی درهــەم باشــترە لــەدانی چــونکە دانــی غــەمو پەژارەیــە، ئەگــەر درهــەمێکی دزیو کردی بەخێر شتێك دەگێڕێتـەوە گـوێی لێناگیرێت.

* ئەگەر دە درهەمی پێبوو بوو بە پێنج کەمبوونی ماڵو داراییەتی، ئەگەر پێنج درهەمی پێبوو بوو بە دە مـاڵو دارایـی زیاد دەکات.

* هەندێکــدەڵێن: درهــــەم لەخــــەودا بەڵگــەی شــەڕو خراپەیــە ، ســـەرجەم ئەوەی بەسکە لێدەدرێ هەروایە.

* درهــــەم بەڵگەیــــە لەســــەر گوتــــەو دووبارەبوونەوەی شتە جوانەکان.

* درهــەم گوتــەو شــەڕە ئەگــەر دیـارو بەرچـــــاوبوو، ئەگـــــەر درهـــــەمی لەتورەکەیەکــدا بەخــشی یــاخود لەتورەکەیەکـدا شـاردییەوە بـەنهێنی

---

[1] **درهەم**: پارەو دراوێکە هەندێك وڵاتی عەرەبی بەکاریدەهێنن. (وەرگێڕ)

دەگونجێت یەك درهەم كوڕێك بێتو وردەكەشی قسەو وتەیەكی خراپ بێت لەگەڵ قاووقیژو دەنگە دەنگدا.

*درهەمی چاك قسەو وتەیەكی باشەو درهەمی خراپیش قسەو وتەی خراپ.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەخەودا بینیم دوو دینار لەگیرفانمدابوو، هەردووكیانم لێكەوتو بەدوایاندا دەگەڕام ، ئەویش پێی وت: تەماشاكە ئەوەت لەكیسچوە شتێكی پێنووسیوی، كاتێ تەماشایكرد دووبەڵگەی لەدەستدابوو.

*هەروەها دەگێڕنەوە: پیاوێك دێت بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)و دەڵێت: لەخەودا بینیم بیستو چوار دیناری بزێردراوم پەیداكردوە، هەموویانم لەدەستدابوو، بەتەنیا چواریانم پێما، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: "تۆ بەتەنیا نوێژ دەكەیتو نوێژی بەكۆمەڵ لەكیسی خۆتدەدەیت".

*هەروەها دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم درهەمێكی كیسراییم بەدەستهێنا، ئەویش وتی: خێرێكت دەستگیر دەبێت ، ئێوارەی بەسەردا رانەبورد هەتا بەدەستیهێنا،ئنجا یەكێكیتر هات بۆلایو وتی: لەخەودا بینیم درهەمێكی عەرەبیم بەدەستهێنا ئەویش پێی وت: لێت دەدرێت ، ئنجا ئەو پیاوە بەقامچی لێیدا، پاشان لە(ئیبن سیرین)یان پرسی: چۆن زانیت؟ وتی: درهەمی كیسرایی تاجو سەوڵەدانی تێدایە بەلاَم عەرەبی سكەیەكی لێدراوە بەم چەشنە.

*یەكێكیتر هات بۆلایو پێی وت: لەخەودا بینیم سكەی درهەمم لێدەدا ، ئەویش لێی پرسی: تۆ بوێژو شاعیریت؟ وتی: بەڵێ .

*پیاوێكیش لەخەودا بینی درهەمی لەژێرپێدا دانا، خەونەكەشی لای راڤەكارێكی خەو گێڕایەوە، ئەویش پێی وت: تۆ لەئاین پاشگەز دەبیتەوە، خەوبینەر ترسی لێنیشتو ئنجا دەستیكرد بەجیهادو تێكۆشاندا هەتا ئاینەكەی پارێزراوبێت، لەیەكێك لەجەنگەكاندا لەلایەن بێباوەڕانەوە دیلكراو بەشێوازی جۆراو جۆر ئەشكەنجەدرا هەتا لەئاینەكەی پاشگەزببێتەوە، بەڵگەی پاشگەزبونەوەشی ئەوەبوو ناوی خوداوەندی خستەژێر پێ.

*پیاوێكیتر هات بۆ لای وتی: لەخەودا بینیم رووخساری پێغەمبەرم بەقاچ شێلا ، (ئیبن سیرین) وتی: شەو

سۆڵەکەی پێت دانەکەنی، پیاوەکە وتی: بەڵێ، ئەویش وتی: دایکەنە، ئنجا درهەمێك لەنێو سۆڵەکە کەوتە خوارەوە لەسەر درهەمەکە ناوی خواو پێغەمبەر ﷺ ) نووسرابوو.

(نابلسی) دەڵێت: درهەم بەڵگەیە لەسەر کوڕ بۆ یەکێك ژنەکەی دووگیانبێت ، هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر زیکرو یادی خوا، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لێدانێکی بەژانو سوێ.

* هەندێك دەڵێن: ئەگەر لەخەودا درهەمی بەدەستهێنا هەمان ژمارەی درهەمی دەستدەکەوێت.

* ئەگەر بینی قۆڵی بوە بەدرهەمی بەستراو کاروپیشەیەکە بەدەستی دەهێنێت.

* درهەمی پاكو پوخت پاکی ئاینی خاوەنەکەیەتی لەگەڵ باشی مامەڵە لەگەڵ هەموو کەسێکدا.

* درهەمی پەرشو بڵاو لەخەودا قسەو گوتەی باشە.

* ئەگەر درهەمێك بەدەستیەوە ببینێ بوە بە(فلس) بێپارەو پوولدەبێت، ئەوەشی فلسێك بەدەستیەوە ببینێ بوە بەدرهەم خێرو سوودو قازانجی، دەستدەکەوێت لەگەڵ ئامۆژگاری ئەگەر درهەمەکەیبوو بەنیو درهەم نیوەی ئەو ماڵەی کەبەدەستیەوەیەتی لەکیسدەچێت، ئەگەر درهەمەکە بوو بەدینار پارەی دەستدەکەوێت ، ئەگەر درهەمەکە بوو بەپارچەیەك ئالتوون ڕۆیشتنو کۆچکردنە.

* بوونی درهەم سوودو قازانجە.

* درهەمی قەڵب غەشو درۆیە ، لەگەڵ بڕێوپیەیداکردن لەحەرامداو ئەنجامدانی گوناهی گەورەو گران.

* هەروەها دەڵێن: ئەوەی درهەمی چاکی پێ بدرێت دەگیێنو شیوەنی بۆ دەکەن.

* ئەگەر خۆی درهەمی بەخشی بەیەکێك بۆیدەگری.

* ئەگەر بینی درهەم وندەکات یاخود لێی دەدزرێت باوکی نارەزایی لێدەردەبڕێت یاخود خراپە دەگەیەنێت بەباوکی، یان شتێکی لێوندەبێت ناگەڕێتەوە وەك مردنی باوکی.

* درهەم مەڵهەمو هەتوانەو برینو زامی پێسارێژ دەکرێتو غەمو پەژارە لەیەکێکی دڵتەنگو پەژارەدار دووردەکەوێتەوە.

* هەروەها درهەم بەڵگەیە لەسەر:

+غەم و پەژارە ، ئەگەر درهەمەکە قەڵبوو بەڵگەیە لەسەر غەش و ناپاکی لەگوتەو کرداردا لەگەڵ دووڕوویی و ڕووپامایی لەکرداردا.

*درهەمی ڕوون و درەوشاوە دەستەڵات و فەرمانڕەواییە یان ماڵ و داراییەکی جەمکراوە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+زیندانی و لێدان.

+فرۆشتن و کڕین.

+دڵنیابوون لەترس و بیم.

+فراوانی لەرزق و ڕۆزیدا.

*ئەگەر درهەمەکان تێکەڵبوون لەگەڵ دیناردا بەڵگەیە لەسەر گیرابوونی دوعاو نزاو بەجێهێنانی پێداویستی و چاکبوونەوە لەنەخۆشی، درهەمی قەڵبیش: قسەو گوتەیەکی خراپە ، یان خزمەتکارێکە هیچ خێرێکی تیا نییە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەجێهێنانی پێداویستی بەزۆر.

**درێژیی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی درێژبوە کردارو ماڵ و دارایی زیاد دەکات، ئەگەر خەوبینەر دەستەڵاتداربوو بەهێزدەبێت و ناوبانگی باشدەردەکات، ئەگەر بازرگانبوو بازرگانییەکەی سوودمەند دەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾ (البقرة: ٢٤٧).

*ئەگەر خەوبینەر ڕژدبوو خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر هەتیوی و منداڵبوون.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەئەندازەی خۆی زیاتر درێژبوە چارەنووس و مەرگی نزیکدەبێتەوەو لەپلەوپایەی دەکەوێتەخوارەوە.

*ئەگەر پادشایەك بینی باڵای بەرزبوە موڵك و دەستەڵاتی بەردەوام دەبێ و بەسەر دوژمنەکانیدا سەردەکەوێ.

*درێژی باڵا بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی ، ئەگەر لەئاستی خۆی زیاتر درێژبوو بەڵگەیە لەسەر مردن.

*هەروەها کورتی باڵا بەڵگەیە لەسەر نزیکی ئەجەل و چارەنووس.

*درێژبوونی باڵای کورت بەڵگەیە لەسەر فیتنەو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تواناداریی باڵابەرزو بێخێری لەهەمانکاتدا ، ئەگەر کورت بووەوە بەڵگەیە لەسەر نزمی پلەوپایە یاخود نزیکی چارەنووس و ئەجەل.



**دڕانی قوماش:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تەلاق و حەلاڵبوون بەبێ چوونەلای هاوسەرێکیتر.

**درك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی دەشتەکی نەزانو رەقو زبرە ، هەروەها دەڵێت: فیتنە یا قەرزارییە.

*ئەگەر بینی بەسەر درکو دالا دەڕوات لەدانەوەی قەرزەکانیدا دوایدەخات، ئەگەر زیانی لەدرکەوە پێگەیشتن قەرزێکی تووشدەبیو رقی لێدەبێتەوە بەئەندازەی ئەو درکەی پیاهەڵدەچەقێ.

*هەموو دارێکی درکدارپیاوێکی رەقو زبرە.

(نابلسی) دەڵێت: درك پیاوی نەزانی بێباوەڕو دنیایە، هەروەها دەڵێن: درك بەڵگەیە لەسەر ئێشو ئازار ئەمەش بەهۆی تیژیو توندییەوە.

*درك بەڵگەیە لەسەر:

+ئاڵۆزبوونی شتومەك.

+غەمو پەژارە بەهۆی توندییەوە.

+عیشقو ستەم لەخەڵکێکی خراپەوە.

+زەرەرو زیان کەبەهۆی ژنەوە تووشی مەردوم دەبێت.

**دڕندە:** (**وەحش**): (نابلسی)دەڵێت: بینینی دڕندە بەڵگەیە لەسەر پیاوانی دەشتەکیو بیدعەچیو ئەوانەی لەکۆمەڵ دووردەکەونەوە.

**دڕنەماسی**(**قرش**): (نابلسی) دەڵێت: ناوی گیاندارێکی دەریاییە بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەرزی هیمەتو پلەوپایەو، بەرزی رەچەڵەك چونکە لەدەریادا بەرزەو هیچ گیاندارێکی دیکەی دەریایی زاڵنابێت بەسەریا هەربۆیە بەو چەشنە ناوزەدکراوە.

## دز

**دز**( **جەردە** ): دز پیاوێکی قوڵبڕە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئابڕوشکێنی ژنانی مێرددار کەدەچنەسەر جێی بەحەرامی لەگەڵیان یان راوچی باڵندەو کۆتر.

*دزی نادیار بەڵگەیە لەسەر فریشتەی مەرگ، چونکە لەناکاو روحدەکێشێو بێ رازیبوون خۆیدەکات بەماڵدا. ماڵو سامانو روحیش لەلێکدانەوەدا وەك یەك وایە.

*دەگونجێت دز بەڵگەبێت لەسەر دڕندەومارو دەستەلاتدار.

*هەروەها وتراوە: دزی رەش تێکەڵیەکی رەشەو هی سپیش بەڵغەمەو سوریش خوێنەو زەردیش زەرداوە.

*ئەگەر بینی دزێك چوەتە نێوماڵێكو شتێکی لێبرد مرۆڤێك لەو جێگەیەدا دەمرێ ئەگەر هیچی نەبرد نزیکبوونەوەی مرۆڤێکە لەمردن پاشان قوتارو رزگاربوونیەتی.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا نەخۆشیو ناساغییە لەسروشتەوە، ئەگەر رەشبوو رەشدەبێ ، ئەگەر سووربوو خوێنە، خۆئەگەر زەردبوو زەرداو دەبێت ، ئەگەر سپیشبوو بەڵغەم دەبێ.

* ئەگەر بینی دزەکە شتێکی هەڵگرت نەخۆشیو خراپبوون روو لەناوەڕۆکی ئەوشتە دەکات کەئەو هەڵیگرتوە ، ئەگەر هیچی هەڵنەگرت نەخۆشدەکەویَ پاشان خێرا چاکدەبێتەوە، ئەگەر نوسا بەدزەکەوە چارەسەری ئەو نەخۆشیە دەزانیَو لەسەری رادمێنیَ.

* دز پیاوێکە غەیبەتی مرۆڤدەکاتو دەیکوژیَ ئەگەر بینی شتێکی دزی.

* دز فریشتەی گیانکێشانەو گەڕانەوەی موسافیرو دەزگیرانە.

* ئەگەر دزێکی بینی لەدەرگایەکیداو هیچی نەبرد نەخۆشێك لەو شوێنەدا قوتار دەبێ لەنەخۆشیەکەی.

* ئەگەر دزێکی کوشت لەنەخۆشی قوتاردەبێ.

* ئەگەر دزێك خۆیکرد بەماڵێکداو ژنێکی رەبەنی تێدابوو ئەو ژنە دەستنیشاندەکات.

* دز بەپیاوێکی فێڵاویو قۆڵبڕ لێکدەدرێتەوە.

* دز پیاوێکی زیناکارە چونکە خۆی دەشارێتەوە.

* دز پیاوێکە راوی مریشكو کۆتر دەکات.

* ئەگەر مرۆڤێك دزێکی بینی ئەگەر لەزانستپەروەرانبوو سوودی لێوەردەگیریَ.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیناو گوێهەڵخستن.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی ملکەچی رسوایە.

**دزی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دزی نادیار فریشتەی مەرگو گیانکێشانە، دزی دیارو بەچاو سوود لەئەوەی دزیویەتی وەردەگری یان لەو ئامۆژگارییەی وەریگرتوە یان سوود بەشێوەیەکی گشتی وەردەگریَ.

* ئەگەر بینی دزێکی نادیارو نەناسراو چوە نێو ماڵەکەیو تەشتو تەنەکەی زبڵدانەکەی دزی ژنەکەی دەمریَ یان پارەی دەدزریَ.

(نابلسی) دەڵێت: دزی موروو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زیناو سووخۆری.

* دز لەخەودا فریشتەی گیانکێشانە ، ئەگەر بینی درهەمەکانی دەدزریَو ناسراوبوو قسەهێنەرو قسەبەرەو فیتنەیی دەکات، ئەگەر نادیارو بەتەمەنبوو هاوڕێکەی درۆ هەڵدەبەستیَ بەدەمیەوە، ئەگەر لاوبوو دوژمنەکەی درۆدەکات بەدەمیەوە.

*هەروەها دەڵێن: دزی باشە لەخەودا بەڵگەی خێرە مەگەر بۆ یەکێك بیەوێت فرۆفێڵ بکات.
*ئەگەر بینی خۆی ماندەدات یان دزی دەکات دزو جەردە لێیدەترسن.
*دەگونجێت دزی سەرپێچی بێت‌و دز ئەنجامی بدات.
*ئەگەر بینی دزیدەکات زینا یا درۆ دەکات چونکە هەریەك لەزیناکارو دز خۆیان دەشارنەوە.

## دڵ

**دڵ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دڵ ئازایەتی‌و لێبوردەیی‌و چاونەترسی‌و چاکی‌و دڵفراوانی‌و توندوتیژی‌و چاکی‌و خراپی دەگەڕێتەوە بۆ لەش‌و لاری چونکە ئەو خاوەنی لەش‌و لارو کاروبارەکانیەتی خراپیشی دەگەڕێتەوە بۆ لەش‌ولار.
*هاتنەدەرەوەی دڵ لەسنگ بەباشی ئاین‌و دڵسۆزی‌و تەواوبوون‌و ڕێنومایی حەق‌و راستی راڤەدەکرێ.
*هەروەها دەڵێن: دڵ بەڵگەیە لەسەر ژنی خەوبینەر، چونکە کاروبارەکان ڕێکدەخات، ئەگەر بینی دڵی ئەگەر نەخۆشبوو چاکدەبێتەوەو دەرووی لێدەکرێتەوە.

*دڵ بەڵگەیە لەسەر خراپی ژیاننامەی سەبارەت بە ئاین‌و نەخۆشکەوتنی دڵ بەڵگەیە لەسەر دووڕوویی بەپێی ئایەتی: ﴿ في قلوبهم مرض ﴾ (الأحزاب: ١٢).
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ترس‌وبیمی لەدڵدا بەدیکرد ڕێنمویی دەکردێ بۆ لای حەق‌و راستی بەپێی ئایەتی: ﴿حَتَّى اذا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِم ﴾ (سبأ:٢٣)، دڵ پادشای لەش‌ولارەو هەڵدەستێت بەئەنجامدانی کاروبارەکانی ئاین‌و دنیا بەنهێنی‌و ئاشکراو پارێزگاریکردن لەرێکخستن‌و بابەتی نهێنیەکەی ئەو چاك‌و خراپیەی تێدایە لەلێکدانەوەدا دەردەکەوێت هەروەك باسکرا.
*هەروەها دەڵێن: دڵ بەژنان لێکدەدرێتەوە ، دڵ ئاین‌و ژیری مرۆڤە.
*ئەگەر بینی دڵی لەسنگی دەرهێنرا یان ڕۆیی یاخود باریکرد لەترسا لەئەنجامی ڕووداوێك ڕووی تێبکات یا ئەقڵ‌و ژیری ببات.
*ئەگەر بینی دڵی ڕەشداگیرساوە گوناهێکی وێڵ‌و سەرگەردانە لەسەر دڵی کوێرو ڕەشی نوسراوە.

* ئەگەر بینی دڵی بچڕاوە ، ئەگەر لەوانەبێت لەخودا دەترسن‌و دنیانەویستیان هەیە دڵی لەگەڵ خودایەو هیچ شتێك سەرقاڵیناكات بەهۆی ترس‌و بیمی پێوەی، دەگونجێت دڵی لەئاخ‌و پەشیمانیدا بچڕێ بەهۆی خراپی حاڵ‌و باری ئەوەی بەڕێزە لەلای، دەگونجێت سەرقاڵبێت لەپەروەردگار.

*دڵ جێگەی ڕێكخستنە ئەگەر ئێش‌و ئازاری لەدڵیا بینی كاروبارەكانی خراپن‌و دڵیش فەرمانڕەواو سەربازەكانییەتی.

**دڵتەنگی:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا تووشی یەكێكهات بەڵگەیە لەسەر بێزاری‌و نیگەرانی.

**دڵڕەق:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا هێرشبەرێكی دەستبڕە.

**دڵڕەقی( توندوتیژی ):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا دڵڕەقبوو لەكاتی یادی خوادا یان لەكاتی باسكردنی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەیە لەسەر پركردنەوە وێڕای ڕۆچوون لەسەرپێچی‌و گوناهدا.

**دڵكرانەوە:** دڵكرانەوەی مرۆڤ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تەوبە لەگوناه بۆ بێباوەڕو موسوڵمانبوونی، ئەگەر خەوبین لەناخۆشیدابوو خوداوەند دەرووی لێدەكاتەوە.

**دڵەڕاوكە :** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دڵەڕاوكێ: هەڵهاتن‌و ڕاكردنە، ئەگەربینی تووشی دڵەڕاوكەبوە لەكارێك هەڵدێت لەدەستەڵات یان بازرگانی یاخود پیشەسازی‌و بەربەرەكانی.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر هەڵهاتن‌و دووركەوتنەوەی خەڵكی لەئامۆژگاری یان بەمەزنداناني زانایەك بەپێی ئایەتی:﴿بَل لَّجُّوا فِي عُتُوٍّ وَنُفُورٍ﴾(الملك:٢١).

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شەڕ ئەنجامدان یاخود بینینی بەپێی گوتەی پێغەمبەر(ﷺ): ((خێر سروشتییەو شەڕیش دڵەڕاوكەیە))[1].

*ئەگەر خۆی لە دڵەڕاوكەدا بینیەوە لەكارێك بێزا دەبێ یان خەڵكی لێدووردەكەونەوە.

**د ن**

---

[1](ئیبن ماجـه) (٢٥)و (ئیبن حبان) (٨٢/موارد) هەروەها بڕوانە (الصحیحة ٦٥١)ی شێخ (ئەلبانی).

**دنیا**:(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ژنە هەروەك چۆن ژن لەخەودا دنیایە، ئەوەی ببینێ وەك ئەوەی وازی لەدنیا هێناوە ژنەکەی تەلاقدەدات.

*ئەگەر بینی هەموو دنیا تیادەچێت جگە لەخۆی زیاتر کەسی دی نەماوە کوێر دەبێت.

*ئەگەر بینی دنیا بەرابەرو هاوەڵەبۆی چەن هەولبدات شانازییکات هەرتیادەچێت.

*بینینی دنیا لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئارەزوو رابواردنو لەخۆباییبوونو شکانی پەیمانو بەڵێن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+هاوسەرو ماڵو کوڕ.

+کێلانو سوودو قازانجکردن لێوەی.

+وێستگەیەك بۆ رۆشتن لێی.

+لانەو ماڵێکی وێرانو کاول.

+ژنی داوێنپیس.

+نەخۆشیو سەرشۆڕیو لادانو رێنوێنیو بەرچاو روونی.

+سەرکەوتن.

+خۆشەویستی دوو دوو.

*ئەگەر دنیا لەشێوەیەکی جوانو قەشەنگدا بەدەرکەوت بەوچەشنەیە کەباسمانکرد، ئەگەر لەشێوازێکی ناشیریندا بەدەرکەوت چاودێری خواییە بۆ خەوبینەر.

*ئەگەر داوای دنیایکرد بەلام هەڵهات لێی یاخود رێگربوو لێی بەڵگەیە لەسەر فیتنەو زۆرماندبوون لەبەدەستهێنانیدا.

*دەگونجێت دنیا بەڵگەبێت لەسەر قورئانی پیرۆز چونکە قورئان مانگی رۆشنی دنیایە.

**د و**

**دواج**[1] :(ئیبن سیرین) دەڵێت: دواج پشتەو بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری ژن ئەگەر بیپۆشیو پێوەی بنوێت.

*ئەگەر بینی ئەو جۆرە جلوبەرگە لەدوروگەوهەرە هاوسەری ژنەکە قورئان خوێنە.

*ئەگەر ئەو جلوبەرگە وێنەی سمۆرەو رێوی تیابوو هاوسەرەکەی ناپاکە بەرانبەریو پیاوێکی ستەمکاری ناپاکی کردوە بەدۆستی خۆی.

**دوانگە( میحراب )**:(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی لەدوانگەیەکدا نوێژدەکات بەبێنەوەی کاتی نوێژکردن هاتبێت خێرە لەدوای خۆی بۆجێنشینەکانی بەدیدێت.

---

[1] **دواج**: جۆرە جلوبەرگ وپۆشاکێکەو (ئیبن دورەی) دەڵێت: وانازانم عەرەبی بێت، هیچ راڤەیەکی نەکردوە (اللسان : مادة :دوج).

*ئەگەربینی لەدوانگەکەدا چەند تنۆکێك میزیکرد هەر تنۆکێ تنۆکە ئاوی کوڕێکی ڕێزدارە کەدەبیێت، دوانگە لەبنەڕەتدا کوڕێکی نەجیبو ڕەسەنە ، دوانگە لەبنەڕەتدا سەرۆکی دادگایە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك بینی لەدوانگەیەکدا میزدەکاتو لەراقەکارێکی خەو دەپرسێ ئەویش دەڵێ: کوڕێکت دەبێو دەبێت بەپێشەوای خەڵكو پابەندو وابەستە دەبن پێوەی.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی پێشەوا یان سەرۆکێکە ، ئەگەر تەماشایکرد لەدوانگەیەکدا نوێژدەکات مژدەیە ، ئەگەر ژنێك خەوێکی لەو جۆرەی ببینێ کوڕێکی دەبێ.

*ئەگەربینی پێشەوایەك لەدوانگەیەکدا نوێژدەکات ئەوکارەی ئەنجامیداوە بەباشی پێیدەگات.

*بینینی دوانگەی هەزاران بەڵگەیە لەسەر شەونوێژو دڵسۆزیو حەزکردن لەگۆشەگیری.

*دەستنیشانکردنی دوانگە لەماڵاندا بەپەنجە بەڵگەیە لەسەربوونی منداڵی نێرینە لەوشوێنەدا، وەگەرنا ئەو شوێنە وەقفی خودادەکرێ.

*دوانگەی خراپ بەڵگەیە لەسەر پێهەڵخلیسکانو وتەی ناڕێك.

*دەگونجێت دوانگە بەڵگەبێت لەسەر رزقو رۆزییەکی حەڵاڵو هاوسەری چاك بەپێی ئایەتی: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِنْدَهَا رِزْقًا﴾ (آل عمران:٣٧).

*ئەگەر دوانگەی مزگەوتبوو دەرچوبوو لەئاراستەی قیبلە یان بۆنی ناخۆشبوو یاخود کەلاکێکی بۆگەنی تێدابوو بەڵگەیە لەسەر بێباوەڕی خەوبینەرو بیدعەی یان دووڕوویی.

(نابلسی)دەڵێت: دوانگە دەستەڵاتداری عەرەبو پلەوپایەی باشو کۆمەڵی ئیسلامە. ئەگەر خۆی لەسەر دوانگەیەك بینیو بەچاکە دەدوا ئەگەر شایستەبوو پلەوپایەی بەرزو شکۆمەندی بەدەست دەهێنێ، وەگەرنا بەڵگەیە لەسەرئەوەی هەڵدەواسرێ.

*ئەگەر فەرمانڕەوایەك بینی لەسەر دوانگەیەکەو دوانگەکە شکا یان کێشمەکێشی لەسەرکرد یان بەزۆر دابەزێنرا، موڵكو دەستەڵاتەکەی دەڕوات بەمردن یان هەرشتێکیتر.

*ئەگەر خەوبینەر دەستەڵاتدار نەبوو لێکدانەوەی خەوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ

ناوەکەی یان کەسێکی دەستەڵاتدار لەهۆزو تیرەکەی.

*دەگێڕنەوە پیاوێك هات بۆ لای (جەعفەر)ی (صادق) (رەزای خوای لێبێت)و وتی: لەخەودا بینیم لەسەر دوانگەیەکم وتاردەدەم ئەویش پرسی: پیشەکەت چییە ؟ وتی: ناتری حەمامم وتی: لای دەستەڵاتدار شکاتت لێدەکەن‌و پاشان هەڵدەواسرێت ، پاشان بەو چەشنە بوو کەبۆی لێکدرایەوە.

*دەگێڕنەوە پێغەمبەر (ﷺ) لەخەو هەڵساو بزەیەك لەسەر لێوەکانیبوو وتی: "نەوەکانی مەروانم بینی یەك بەدوای یەکدا دێنە سەر دوانگەکەم"[1].

فەرمایشتەکەی پێغەمبەریش بەو چەشنەبوو.

(نابلسی)دەڵێت: دوانگە دەستەڵات‌و زاڵبوونە بەسەر دوژمندا.

*دەگونجێت دوانگە بۆ یەکێك سەربکەوێت بەسەریا هاوسەرێك بێت دەستنیشانی بکات وەگەرنا ئابڕوچوونە.

*ئەگەر دەستەڵاتدارێك سەرکەوت بەسەر دوانگەیەکدا موڵك‌و دەستەڵاتی بەردەوام دەبێت‌و زاڵیشدەبێ بەسەر دوژمنەکانیدا.

*ئەگەر وتاریدا لەسەر دوانگەیەك‌و هەردوو دەستی بەسترابووە بەڵگەی هەڵواسینیەتی یان کەسێکی خراپەکارە.

**دواوە( پشت )**:(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ئەوەیە کەدەربارەی دەوترێ لەسوپاس‌و رووتێکردن یان بەرزی‌و ملکەچی‌و یاخود قەرزاری.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەڵگرتنی شوێنەوار.

*ئەگەر سپێتی یان بۆنی خۆش یاخود نورو رووناکی روویکردە پاشی یاخود بوو بەئاسن بەڵگەیە لەسەر سوپاسکردنی لەوەی دێتە رێی.

*ئەگەر زام‌و برینی بەپاشییەوە دی بەڵگەیە لەسەر ملکەچی‌و دۆڕانی یاخود قەرزێکدەیکات.

*ئەگەر بینی پاشی ئەستوربوە بەهێزدەبێت لەسەر ئارامگرتن لەوەی خوداوەند دایناوە.

*ئەگەر تووك‌و مووی بەپاشیەوە بینی ماڵ‌و سامانێك قەرزار دەبێ‌و هەر ئەو ئەندازەیەشی پێدەبێت، ئەگەر تووکی پێوەنەبوو بێپارە دەبێ ، ئەگەر

---

[1] (هەیسەمی) لە (مجمع) (٥/٢٤٤)هێناویەتی‌و وتویەتی: (طبرانی) هێناویەتی‌و (زید)ی کوڕی (معاویە)ی تێدایە کە (فەرامۆشکراوە).

تووكەكـەی تاشـی ئەمانەتەكـە دەگەیەنیّو قەرزەكەی دەداتەوە.

**دوابین شوێن پێغەمبەر پێی گەیشتبێ لەئاسماندا (سدرة المنتهى):** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گەیشتن بەمەرام بۆ سەرجەم ئەوەی بەڵێنی پێدراوە.

**دوژمن(نەیار ـ ركەبەر):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەرزكردنەوەی پلەوپایە لەبەرانبەر نەیارو بوونی پشتگیری لەلایەن خوداوەو سەركەوتن بەسەر نەیارو بەرانبەردا.

*ئەگەر بینی مرۆڤێك دژایەتی لەگەڵدا دەكات هاوڕێیەتیدەكات.

*ئەگەر دوژمنێك هەڕەشەی لێكرد خێری دەستگیر دەبێت بەپێچەوانەوە ئەگەر ئامۆژگاریكرد ناپاكی لەگەڵدەكات.

*ئەگەر بینی دوژمنێك چوە نێو زەوییەك لای تیا هەڵسابوو پاشان دوژمن دیلی كرد غەمو پەژارەیەكی زۆر رووی تێدەكات.

*ئەگەر بینی دیلە لەلای دوژمن گوناهی ئەنجامداوەو پەشیمانی پێویستیەتی.

*ئەگەر بینی ئەسپەكانی دوژمن دەدەن بەسەریا لەولاتی خۆیدا بارانەدەبارێت بەسەریاندا یاخود لافاو هەڵدەستێ.

**دوژمنایەتی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی دژایەتی لەگەڵ كەسێكدا دەكات خۆشەویستیو تەبایی بنیاد دەنێ بەپێی ئایەتی: ﴿عَسَى اللهُ أن يجعل بينكم وبين الذين عاديتم منهم مودة﴾ (الممتحنة: ٧) غەیبەتو باسكردنو زیانەكەی دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەكەی، ئەگەر باسی پیاوێكیكردو لەكەداریكرد بەهەژاریی خوداوەند خۆی هەژاردەكات، ئەگەر بەشتێكیتر غەیبەتیكرد بەهەمان سیفەت تاقیدەكرێتەوەو تووشدەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: دوژمنایەتی بۆ دوژمنانی خوا بەڵگەیە لەسەر باوەڕو پاكیو تێكەڵبوون لەگەڵیان بەڵگەیە لەسەر پێچەوانەی قورئان جووڵانەوەو پاشگەزبوونەوە لەسوونەتی پێغەمبەر(ﷺ).

*ئەگەر بینی مرۆڤێك دوژمنایەتی بۆ نواند هاوڕێیەتیدەكات، دوژمنایەتیش دەرخستنی نهێنیو پەنهانە.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەیەكی باش وەك دادوەریی.

**دوعا(نزاو پاڕانەوە):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی دوعایەك دەكات

نوێـژێکی فـەرز ئەنجامـدەدات ، ئەگـەر دوعایــەکیکردو نــاوی خوداوەنــدی تیانـەبوو نوێـژێك بـۆ روپامـایی ئـەنجام دەدات، ئەگــەر لەخــەودا بینــی وەك ئەوەی دوعاو نـزا بـۆ خۆیـدەکات ئـەوە خوداوەنــد منــدالێکی نێرینــەی پێدەبەخــشێ بــەپێی ئایــەتی: ﴿اذ نادى ربه نداءً خفيا﴾ (مريم: ٣).

*ئەگــەر لەتاریکیــدا پاڕایــەوە پــەروەردگار لەغــەمو پــەژارە قوتاریدەکات بەپێی ئایەتی: ﴿فنادى في الظلمات﴾ (الأنبياء: ٨٧).

*بــاش دوعــاگۆیی بەڵگەیــە لەسـەر ئاینباشـی ، دوعـاش بەڵگەیـە لەسـەر گوێڕایەڵی لەگـەڵ زۆریـادکردنی خـوای گـەورەو بەڵگەیـە لەسـەر سـەرکەوتن بەپێی ئایەتی قورئـان : ﴿وذكروا الله كثيرا وانتصروا من بعد ما ظلموا﴾ (الشعراء: ٢٢٧).

(نابلسی) دەڵێت: دوعا لەخەودا:

+بەندایەتیــە لــەکاتی بێــداریی‌و ئاگاداریدا.

+نوێژێکە نوێژخوێن ئەنجامیدەدات.

*هەروەها دوعا بەڵگەیە لەسەر:

+گەیشتن بەمەبەستو مەرام.

+کوڕ.

*ئەگــەر دوعاکەبــەکوڵبوو و هــاوارو قیـژەی تیـابوو بەڵگەیـە لەسـەر بـەڵاو نەهامەتی‌و فیتنەو ئاشووب.

*دەگونجێـت دوعـا بەڵگـەبێت لەسـەر کـەمبارانی ئەگەردەنگـەدەنگو هـەرای لەگەڵـدابوو، ئەگـەر کۆمـەڵێکی بینـی کۆبوونەتەوە دوعادەکەن کۆبوونـەوەی منالآنــە یــان فەڕویەرەکەتــە لەگــەڵ مەزنی‌و رەواندنەوەی بەدبەختی.

*ئەگـەر بینـی خـۆی لـەدوعا پاراسـت کاری حەرامو نابەجێ ئەنجامدەدات.

*ئەگەر بینی لەخوداوەنـد دەپاڕێتـەوە یان بانگدەکرێ خێری دەستدەکەوێت.

*نــزاو پاڕانــەوە بەڵگەیــە لەســەر بەجێهێنانی پێداویستی.

*هــەروەها دەڵــێن: بەڵگەیــە لەســەر گیرابــوون بەتایبــەت ئەگــــەر لەمزگەوتدابوو.

*ئەگــەر بینــی پیاوێــك بانگــدەکات لەترسو بیمدا لەترسا دەپاڕێتەوە.

(نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر وەڵامدانـەوەو رێنومـایی‌و رزق‌و رۆزی‌و پیاهەڵــدان دژ بەگــەورەو ستایشکردنیان.

*ئەگەر بینی دوعادەکات گوێڕایەڵە.

**دوکـان( فرۆشـگا )**: (نابلـسی) دەڵێـت: ئەگــەر دوکــانێکی بینــی لەبــەردەم

ماڵەکەیدا هاورێیە بۆ ژنێکی خاوەن ماڵو لانە یان خەوبینەر.

*ئەگەر بینی دانیشتوە لەسەر دوکانێك دەستەڵاتو شکۆو مەزنیو پلەوپایەو نیعمەتی پێدەگات ئەگەر شایستەبێت.

**دوکەڵ**:(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ترسو بیمو غەمو ستەمە لەلایەن پەروەردگارەوەو سزایە بۆ دەستەلاتدار.

*ئەگەر دوکەڵێکی بینی لەفرۆشگاو دوکانەکەی دێتە دەرەوە دەکەوێتە نێو فەرو خێرەوە دوای نەهامەتیو ئابروچوونو تەنگ پێهەڵچنین لەبژێویو دارابیدا.

*ئەگەر دوکەڵی ئاگربوو یاخود لەژێر مەنجەڵێکدابوو گۆشتی تیالێدەنرا فەرو خێرە لەگەڵ خۆشیو شادی دوای بەڵاو نەهامەتی رووی تێدەکات.

*ئەگەر دوکەڵی داربوخوردبوو یاخود شتێکبوو بۆگەنی نەبوو بەڵاو نەهامەتیەك رووی تێدەکاتو پاشان ئابروچوونو خراپەیە.

*ئەگەر بینی دوکەڵ رووپۆشی ئاسمانی لێداگیر دەکات نەخۆشدەکەوێت.

*ئەگەر گەرمای دوکەڵ لێیبدا لەزستان یا هاوین غەمو پەژارەیە.

*بینینی دوکەڵ نەهامەتیو بەڵایەکی گەورەیە لەگەڵ کوشتارێکی سەختو گران، ئەگەر بڵێسەی لێهەڵدەستا کۆبوونەوەیە بەبێجەنگ لەگەڵ فیتنەی بێکوشتار.

*دوکەڵ لەخەودا ئەگەر زیانی بەخەڵکی گەیاندو چاوی داپۆشین بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو ستەم یاخود سزایەك لەلایەن خوداوەندەوە روویان تێدەکات لەتیاچوونو نەبوونیو قاتو قڕی.

*دەگونجێت دوکەڵ بەڵگەبێت لەسەر هەواڵو دەنگو باس لەولایەوە کەتێدا سەرهەڵدەدات.

**دوگمە** :لەخەودا پارێزگاریو گرێیەکی راستو دروستە بەتایبەت ئەگەر لەزیو یا ئاڵتوونبوو.

*دوگمەو پەت بەڵگەن لەسەر پیاووژن، ئەگەر بینی سواری دەوگمەیەکبوە کەبەپەتێکەوە بەستراوە، هاوسەرگیری ئەنجامدەدات ئەگەر رەبنبێت، وەگەرنا شتێك دروستدەکات ناکۆکی تێدا بەرپا دەبێت.

**دومەڵ( زیبکە )**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵو داراییە بەئەندازەی کێمو زوخمی نێوی.

(نابلسی) دەڵێت: لەبەرئەوەی لێکدانەوەی کێمو زوخمی ماڵێکی

هەڵسپێراوە هەركات تیادەچێت وەك خۆی لێدێتەوە.

**د وو**

**دووپشك:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پیاوێكی فیتنەیە هەندێك لەخزمەكانی دەكوژێت.

*ئەگەر بینی دووپشكێ بەئاگر سووتێنرا دوژمنەكەی دەمرێت.

*ئەگەر دووپشكێكی هەڵگرتو فرێیدا بەسەر ژنێكدا داوێنپیسی ئەنجام دەدات.

*هەروەها دەڵێن: دووپشك ژنە كوشتنیماڵو سامانێكە تیادەچێت ، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ لای ، پێوەدانی ماڵو سامانێكە تیادەچێت ، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ لای.

*ئەگەر بینی لەشەرواڵو پانتۆڵەكەیدا دووپشكی تێدایە بەڵگەیە لەسەر تێكچوونی هاوسەرەكەی هەروەها بەهەمان شێوەیە ئەگەر لەسەر جێگەكەی بینی.

*ئەگەر بینی گەیشت بەدووپشكێ نهێنیەك لای دوژمنەكەی دەدركێنێ.

*ئەگەر چەند دووپشكێكی لەسكیدا بینی دوژمنەكانیەتی لەخزمەكانی خۆی.

*ئەگەر گۆشتی دووپشكێكی بۆگەنی خوارد ماڵو سامانێكی حەرام لەدوژمنێكی فیتنەوە بەهۆی میراتییەوە بۆ دەمێنێتەوە یان لەشتێكیترەوە.

*چزووی دووپشك زوبانی پیاوێكی فیتنەیە.

*دووپشك لەبنەڕەتدا دوژمنی زوبان پیسەو سەرجەم گیاندارانی زیانبەخشو دوژمنە بەبێ زیان.

(نابلسی) دەڵێت: دووپشك دەستكەوتنی ماڵو داراییەو كوشتنی ماڵو سامانێكە لەدەست دەردەچێو ، پاشان دەگەڕێتەوە نێودەستی.

*ئەگەر دووپشك پێوەیدا دوژمن باسیدەكاتو بەوئەندازەیە زیانی پێدەگەیەنێ.

*ئەگەر گۆشتی دووپشكێكی بەلێنراوی خوارد یا بەسوورەوەكراوەیی ماڵو سامان لەدوژمنێكی فیتنەوە بەدەستدەهێنێ وەك میراتییەكی حەلاڵ.

*ئەگەر كراسەكەی یاخود فرۆشگاكەی بوبوو بەدووپشك دوژمن غەمو پەژارەو بژێویو كاروكاسبی پێدەدات.

*ئەگەر دووپشكەكەی لەسەر جێگەكەی بینی دوژمن غەمو پەژارە دەكات بەدڵیا.

*ئەگەر دووپشك لەپاشیو دوای هاتەدەرەوە دوژمنو منداڵەكانیەتی

یاخود دوژمنایەتییە دەکەوێتە نێوانیان.

*ئەگەر دووپشکێکی بۆگەنی خوارد باسی پیاوێکی خراپەکاردەکاتو خواردنی گۆشتی کاڵی هەموو ئاژەڵێك بەوچەشنەیە.

*دووپشك دوژمنێکی ئیرادە لاوازی غەیبەتکارە.

*ئەگەر دووپشکێکی بینی پێوەی دەدا بەلاّم لێیدەترسا غەیبەتی دوژمن دەکاتو دەکەوێتە باسوخواسەوە، ئەگەر لێی نەترسا دوژمنە بەلاّم غەیبەتناکاتو زیانی پێناگات.

*ئەگەر بینی دوو پشکێکی کوشت ئەوە زەفەر بەدوژمنەکەیدەبات.

*ئەگەر بینی دووپشکێ بەدەستییەوەیەو بەخەڵکیەوە دەدات مرۆڤێکە غەیبەتی خەڵکیدەکاتو هەندێکیان دووزوبانی دەکەن بەدەمی هەندێکی دیکەیانەوە.

*ئەگەر هاوچەشنی دووپشکی بینیو دووپشك نەبوو پیاوێکە وادەزانێت دوژمنیەتیو دوژمنی نییە.

دوودڵی: (ئیبن سیرین) دەڵێت: دوو دڵی پەشیمانیە لەکارێك یان لەگوناهو تاوانو تەوبە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی دوودڵەو پاشگەزبوەتەوە داوای لێخۆشبووندەکاتو سەرزەنشتی خۆیدەکات لەسەر ئەو گوناهو تاوانەی ئەنجامیداوە.

دوورخستنەوە: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا زیندانە، ئەگەر بینی دوورخرایەوە زیندانیدەکرێ.

*دوورخستنەوە بەڵگەیە لەسەر چەسپاندنی بەڵگەکانی بەرپەرچدار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەستبڕین.

دوورینەوە: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی کشتوکاڵ دەدورێتەوە ئەگەر لەولاّتێکدابوو جەنگی تیا بەرپابوو بوو یان شوێنی ستەمکارو زۆرداران خەڵکی تیادەچن، خۆئەگەر لەولاّتێکدابوو هیچ جەنگێکی تیا نەبوو دوورینەوەی بەروبوومەکەی لەمزگەوتی گەورەی ئەوشارەدابوو کەوتبوە نێوان دوکانەکانو سەربانەکان سزای خواییە یاخود نەخۆشیو بەلاّو نەهامەتییە.

*ئەگەر دوورینەوەی بەربووم لەبازاڕەکاندابوو سوودو قازانجی خەڵکی زیاد دەکاتو خۆشیو شادییان

پتر دەبێت ، ئەگەر لەمزگەوتدابوو خەڵکی خۆیان ئەو بەروبوومەیان دەدوورییەوەو کەسی نەناسراویان لەنێودا نەبوو خێروچاکەی هەریەکێکیان زیاد دەکات.

*ئەگەر دیمەنی دوورینەوە لەکێڵگەدابوو دوای پێگەیشتنی بەروبوومبوو باش‌و چاکە بەلام ئەگەر پێشکات‌و وادەیبوو دووپوویی‌و ناپاکییە لەخواردندا یان لەبەروبوومەکەدا.

(نابلسی)دەڵێت: دوورینەوە بەڵگەیە لەسەر سووک‌و ئاسانکردنی کاروباری قورس‌وگران‌و رزقێکی ئامادەکراوە، ئەگەر دوورینەوە لەکاتی خۆیدانەبوو کوشتارو مردنە.

*ئەگەر بەروبوومی سەوز دوورایەوە، مەرگی پیرو بەتەمەنە.

*ئەوەی لەنێو کشتوکاڵی دووراوەدا بڕوات بەنێو ریزی تێکۆشەراندا تێدەپەڕێ.

**دووریی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ستەم‌و زۆرداریی، دووری ماوەش بێبەشبوونە، دووری کەسەکان شەڕو ئاژاوەیە یان مردن یا لابردنە ، دەگونجێت دووری بەڵگەبێت لەسەر نزیکی چونکە واژوو و پێچەوانەیەتی.

**دوورینەکار:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر فیتنەو ئاشووب، هەموو دوورینەکانیش ئەگەر لەنێو کشتوکاڵی سەوز بوو بەڵگەیە لەسەر بەلاو ئافەدان لەو کشتوکاڵە.

*دەگونجێت بینینان لەکاتێکدا وادەی دوورینەو چنینەوەی بەروبووم نەبێت بەڵگەبێت لەسەر:

+دوژمن.

+قەلاچۆی خەڵکی ئەو شارەیە.

**دووڕەگ:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ڕێزو شکۆمەندییە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پلەوپایەی بەرزو گەیشتن‌و بەویست‌وخوازو کوڕی نەجیب‌و ڕەسەن.

**دووگیانی ژن:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: دووگیانی ژن ماڵ‌و دارایی‌و منداڵ زیادبوونە، دەگونجێت سروشتی واژووی ئەوەبێت لەسەریەتی بەلام ئەگەربینی کوڕیبووە لەبێداریدا کوڕیدەبێت.

*ئەگەر پیاوێك بینی ژنەکەی منالێکیبوە خێرێك رووی تێدەکات، ئەگەر منالێکی کڕی غەم‌و پەژارەیەکی زۆر رووی تێدەکات.

(نابلسی)دەڵێت: دووگیانی ژن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ڕێکخستنی کاروباری خۆی و ماڵ‌ودارایی زۆر بەدەستدەهێنێت لەگەڵ شکۆمەندی و باس و خواسی باش.

*ئەگەر پیاوێك بینی دووگیانبوە غەم و پەژارەیەکی قورس‌وگرانە لەخەڵکی شاردراوەتەوەو دەترسێت بەدەربکەوێت.

*دووگیانی زیادەیە لەدنیادا بۆ خاوەنی خەو ئەگەر نێربێت یان مێ.

*بینینی ژنی دووگیانیش بەڵگەیە لەسەر غەم و پەژارەو کاروباری شاراوە.

*دەگونجێت دووگیانی پیاو بەڵگەبێت لەسەر غەم و پەژارەو نزیکبوونی لەدوژمنەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+عەشق و ئالوودەبوون.

+ئەوەی لەیەك شوێندا نێرو مێ کۆدەکاتەوە.

+چاندنی شتێك لەشوێنی خۆیدا نەبێت.

+ماڵ‌وباری بشارێتەوەو دواتر دەربکەوێ.

+مردن لەرێی گەڕان بەدووی ئاودا.

+دزێك بچێتە نێو ماڵەکەی.

+لەماڵێکی شاراوەدا خۆی بشارێتەوە.

+دزییەك بکات و لەهاوەڵەکەی بشارێتەوە.

*دەگونجێت دووگیانی پیاو بەڵگەبێت لەسەر تیابردنی خۆی بەپەت خۆخنکاندن - .

*دەگونجێت مردوویەکی بێگانەی ئازیزی ئەسپەردەبکرێت.

*دەگونجێت درۆزن و بەدڕەفتارو ڕووداوی دەگمەن دەربکەوێت.

*دەگونجێت بیروباوەڕی نارێك و شێوازی بشارێتەوە.

*دووگیانی کچ لەخەودا دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ناخۆشییەك بگات بەکەس و کارەکەی بەهۆی ئەوەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ڕووداوێکی خراپ لەشوێن و جێی خۆی ڕووبدات لەلایەن دزێکەوە یان بەهۆی ئاگر کەوتنەوەیەکەوە، دەگونجێت جنۆکە دەستی لێوەشاندبێ یاخود ئامێرێکی نەشیاو بەگەڕبخات، یاخود کەسێکی ناشیاو مارەی ببڕێت و بەرلەوەی بیگوێزێتەوە شقڵی کچێنی بشکێنێ و ئەو وادەوکاتەش درێژببێتەوە.

*دووگیانی ژنی نەزۆك یاخود دووگیانبوونی بەڵگەیە لەسەر ساڵی

وشك‌و كه‌می خێرو زۆربوونی فیتنه‌و ئاشووب له‌لایه‌ن دزو جه‌رده‌وه‌.

* ئه‌گه‌ر یه‌كێك ئاژه‌ڵێكی مه‌ترسیداری بینی یان ئاژه‌ڵێكی دڕنده شه‌ڕو خراپه‌ به‌رپاده‌بێت‌و غه‌م‌وپه‌ژاره ئاوێزانی ده‌بێت له‌وشوێنه‌ی كه‌وانیشته‌جێبوه تێیدا.

* ئه‌گه‌ربینی هاوسه‌ره‌كه‌ی دووگیانه خوازیاری خێروخۆشی دنیایه‌.

* ئه‌گه‌ر پیاوێك بینی دووگیانبوه ماڵ‌و دارایی زیادده‌كات.

* دووگیانبوونی ژنی پیر گه‌نجینه‌ی چه‌ك‌و ته‌قه‌مه‌نییه چونكه فیتنه‌و ئاشووبه‌.

* هه‌روه‌ها ده‌وترێت: دووگیانبوونی پیر بێكاری‌و سه‌رقاڵیه یان فه‌ڕوبه‌ره‌كه‌ته دوای وشكی.

* ژنی بێهاوسه‌ر یان كچ گه‌ربیبینێ دووگیانه شووده‌كات.

**دووگی مه‌ڕ:** (نابلسی) ده‌ڵێت: دووگی مه‌ڕ به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر سوێندخواردن یان هیواو ئاوات خواستن.

* ده‌گونجێت دووگ به‌ڵگه‌بێت له‌سه‌ر نازو نیعمه‌تی به‌رفراوان‌و زانستی سوورو گه‌نجینه‌ی باش له‌زانست‌و منداڵ.

* دووگ بۆ ژن ماڵ‌و سامانه‌.

**دوومه‌ڵان( قارچك ):** (ئیبن سیرین) ده‌ڵێت: دوومه‌ڵان پیاوێكی سووك‌و رسوایه یان ژنێكی نزم‌و سووكه‌و خێری تێدانییه ، ئه‌گه‌ر یه‌ك یا دوو یاخود سێ دومه‌ڵان بێت ، ئه‌گه‌ر زۆرتربوو رزق‌و ماڵ‌و سامانه به‌بێماندووبوون به‌پێی فه‌رمووده‌ی حه‌زره‌ت(ﷺ) كه‌ده‌فه‌رموێ: "دومه‌ڵان وه‌ك گه‌زۆیه یا له‌گه‌زۆیه"[1]، له‌به‌رئه‌وه‌ی گه‌زۆ به‌بێ ماندووبوون داده‌به‌زێ بۆیان دوومه‌ڵانیش بێ ره‌گ‌و كێڵان‌و چاندن‌و ئاودان ده‌ردێت.

* هه‌روه‌ها ده‌ڵێن: ئه‌گه‌ر ماڵ‌و سامانبوو ئه‌و ماڵه له‌لایه‌ن ژنانه‌وه‌ ده‌بێ.

(نابلسی) ده‌ڵێت: له‌خه‌ودا پیاوێكی ئه‌مه‌كداره‌و كه‌سانی رێزدار خۆشیان ده‌وێت.

* ئه‌گه‌ر بینی دومه‌ڵانی خوارد ماڵێكی حه‌ڵاڵ په‌یدا ده‌كات.

## دۆ

**دۆڕاندن:** (ئیبن سیرین)ده‌ڵێت: دۆڕاندن بۆ بێباوه‌ڕان چوون یه‌كه به‌پێی

---

[1] (بوخاری) له‌فه‌رموده‌ی (٤٦٣٩)و(مسلم) (٢٠٤٩) له‌فه‌رمووده‌یه‌كی (سه‌عید)ی كوڕی (زید)ه‌وه‌.

ئایـەتی: ﴿ وقـذف في قلـوبهم الرعب﴾ (الاحزاب: ٢٦). بۆ باوەڕداران سەرکەوتنە لەجەنگدا.

*ئەگەر سەربازی دادپەوەری بینی چوەتە نێو شارێکەوە بەدۆڕاوی سەرکەوتن و زەفەر بەدەستدەهێنێت ، ئەگەر ستەمکاربوون سزاو خەشمی خوایی روویان تێدەکات.

*ئەگەر هەڵهاتن لەمردنی بینی بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونەوەی ئەجەل و چارەنووسی بەپێی ئایەتی: ﴿قل لن ینفعکم الفِرارُ ان فررتم من الموت أو القتل﴾ (الاحزاب: ١٦).

*هەروەها وتراوە: هەڵهاتن لەدوژمن دڵنیایی و گەیشتنە بەهیواو ئاوات بەپێی ئایەتی: ﴿ ففررت منکم لما خفتکم فوهب لي ربي حکماً ﴾ (الشعراء: ٢١).

*ئەگەر پیاوێکی بانگکردو هەڵهات لێی هەرگیز وتەی پەسەند ناکات و گوێڕایەڵی ئامۆژگاری خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ فلم یزدهم دُعائي الا فرارا ﴾ (نوح : ٦) وتراویشە هەڵهاتن دڵنیاییە بەپێی ئایەتی: ﴿ ففروا الی الله إني لکم منه نذیر مبین ﴾ (الذاریات: ٥٠).

*ئەگەر لەدوژمنەکەی خۆیشاردەوە زاڵدەبێت بەسەریا، ئەگەر لەرزەلەرزی پێکەوت یاخود جومگەکانی هاتەوەیەك غەم و پەژارە رووی تێدەکات و خۆی لەبەردا راناگرێ.

*بینینی غارغارێنی ئەسپ لەوڵات و گەڕەکدا باران و لێشاوە و ترس و دڵنیاییە و دیلکردن غەم و پەژارەیەکی سەخت و گرانە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بۆ یەکتاپەرستانبوو جل وبەرگە لەجەنگداو سەرکەوتنە بەسەریاندا بەپێی ئایەتی:﴿ وهم من بعد غلبهم سیغلبون﴾ (الروم: ٣).

*ئەگەر بینی شکستی هێنا بەڵام نەترسا دەمرێ.

**دۆزەخ**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: (سابت)ی کوڕی (عەبدوڵلا)ی کوڕی (ئەبی بەکرە) لەباوکییەوە دەگێڕێتەوەو ئەویش لەباپیرەیەوە وتویەتی: ئەگەربینی دەسووتێنرێ دەخرێتە ئاگری دۆزەخەوە، ئەگەر بینی فریشتەیەك ئەستۆی گرتوە دەیخاتە نێوئاگری دۆزەخەوەو ملکەچی و سەرشۆڕی پێدەدرێ.

*ئەگەر دەرگاوانی دۆزەخ بزەو خەندە گرتی دڵخۆشدەبێت بەپۆلیس‌و جەللادو دەستەڵاتدارێك.

*ئەگەر ئاگری لەنزیکەوەبینی دەکەوێتە نێو ناڕەحەتی‌و دەردەسەرییەوەو لێی قوتار نابێت بەپێی ئایەتی: ﴿ورأى المجرمون النّار فظنوا انهم مواقعوها ولم يجدوا عنها مصرفا﴾(الكهف: ٥٣). یاخود زەرەو زیان رووی تێدەکات بەپێی ئایەتی: ﴿ان عذابها كان غراما﴾(الفرقان: ٦٥) هەروەها خەونەکەی ئاگادارییە کەبۆئەوەی تەوبە بکات لەو گوناهو تاوانەی تێیکەوتوە.

*ئەگەربینی وەك ئەوەی خەریکە دەخرێتە دۆزەخەوە گوناهو تاوانی گەورە ئەنجامدەدات کەوابەستەی سزای خواییە.

*هەروەها وتراوە: لەنێو خەڵکیدا روحی دەکێشرێ.

*ئەگەربینی چوە نێو ئاگری دۆزەخ ئەوەی دەیخاتە نێو ئاگرەوە هانیدەدات بۆ خراپەکاری.

*ئەگەر لەنێو دۆزەخ بەدەرکەوت بەبێئەوەی زیانی پێبگات دەکەوێتە غەم‌و پەژارەی دنیاوە.

*ئەگەر لەکێم‌و زوخمی دۆزەخی خواردەوە یاخود لەداری (زەقوم) سەرقاڵدەبێت بەزانیارییەکەوە دواتر دەبێت بەبەڵاو گرفت لێی.

*هەروەها وتراوە: کاروبارەکانی قورس‌وگران دەبێت‌و خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوێنرێژی ئەنجامدەدات.

*ئەگەربینی رووخساری رەش هەڵگەڕاوە بەڵگەیە لەسەرئەوەی هاوەڵایەتی کەسانێك دەکات دوژمنی خودان‌و رازیدەبێت بەرەفتارو کرداری خراپەیان رووی لای خەڵکی رەشهەڵدەگەڕێ‌و چارەنووسی باش نابێت.

*ئەگەربینی هێشتا هەر بەندە تێداو نازانێت لەکەیەوە چوەتە نێوی بەردەوام لەدنیادا بەغەم‌و پەژارەوە دەمێنێتەوەو واز لەنوێژو رۆژو دەهێنێت دەستبەرداری سەرجەم گوێڕایەڵییەکان دەبێت.

*ئەگەر بەسەر پشکۆدا رۆیشت پێدەنێت بەگەردنی خەڵکیدا

لەکۆبوونەوەو دانیشتنەکاندا بەدەستی ئەنقەست.

* هەر خەوێك ئاگری تێدابێت بەڵگەیە لەسەر فیتنەی خێرا بەپێی ئایەتی: ﴿ذوقوا فتنتكم هذا الذي كنتم به تستعجلون﴾(الذاريات: ١٤).

* ئەگەربینی شمشێرەکەی دەرهێناو دەچێتە نێو ئاگرەوە قسەی پرووپووچ و خراپ لەزاری دێتەدەرەوە.

* ئەگەربینی بەروویەکی گەشەوە دەچێتە نێوی خراپە ئەنجامدەدات و بەخۆشیەکانی دنیا خۆشحاڵدەبێت.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر دۆزەخی لەخەودا بینی با لەدەستەلاتدارو فەرمانڕەوا بترسێ یاخود لەخەشم و قینی پەروەردگار.

* ئەگەربینی وەك ئەوەی دەچێتە نێو دۆزەخ ئابڕوو حەیای دەچێت لەهەر گوناهێك تەوبەی لێنەکردبێت.

* ئەگەربینی لەدۆزەخ دێتە دەرەوە لەگوناهو تاوان تەوبە دەکات، ئەگەر لەخواردن و خواردنەوەکانی دۆزەخ بخواتەوە بەردەوام دەبێت لەسەر ئەنجامدانی گوناهو تاوان.

* دۆزەخ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر لەدەستچوونی پلەوپایە لەدنیادا.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+هەژاری دوای دەوڵەمەندی.

+بێزاری دوای شادیی.

+زیندانی هەمیشەیی.

+سەرشۆڕیی و ملکەچی لەدنیادا.

* ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر هاوسەر هاوسەرێکی بۆڵەبۆڵکارو ناڕازی دەبێت.

* ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر بژێوی حەرام و نادروست دەبێت.

* ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر لانەو ماڵ دراوسێیەتی خراپەکارو بێئاگایاندەکات.

* ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی دەرەنجامەکەی بەمەرگ کۆتایی دێت لەگەڵ چارەنووس خراپی.

* ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر خزمەتگوزاری لەگەڵ دەستەلاتدارێکی ستەمکاردا دەبێت.

* ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر زانیاری بیدعەو داهێنانە.

* ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر رەفتارو کردار کردەوەیەکی ناپەسەندە.

* ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر کوڕ بەڵگەیە لەسەر لەدایکبوونی ئەو منداڵە بەهۆی داوێنپیسی و زیناوە.

* دەگونجێت چوونە نێوئاگری دۆزەخ بەڵگەبێت لەسەر ملکەچی و سواڵکەریی دوای دەوڵەمەندی.

*هەروەها بەڵگەیەلەسەر:
+لانەی بیدعەو داهێنان.
+خراپەکاران.
+دێرو کەنیسەو فرۆشتن.
+حەمامو دەباخخانەو فڕنو ئەوەی ئاگری تیادەکرێتەوە لەبۆ بەرژوەندییەك.
+یەکلاییبوونەوە بۆ حەزو ئارەزوو.
*ئەگەر کرویلێسە گرتیەوە لەوانەیە ماڵو دارایی کۆکردوەتەوە.
*هەروەها ئەگەر لەوانەبوو ماڵو دارایی کۆدەکردەوە دۆزەخ بۆ بێباوەڕو دووڕووانە.
*ئاگری (سقر)دۆزەخ بەڵگەیەلەسەر:
+وازهێنان لەراستگۆییو خۆهەڵقورتان لەکارێکدا پەیوەندی پێوە نەبێت لەگەڵ رەزیلیو چرووکی.
+گاڵتەکردنو بەدرۆخستنەوەی رۆژی قیامەت.
+ناوەڕاستی دۆزەخ بۆ شەیتانەکانو ئەوەشی هەمان رەفتاری ئەوان دووبارە دەکاتەوە.
*هەروەها دۆزەخ بەڵگەیە لەسەر ناتەواوی لەکێشانەدا بۆئەوەی کێشانەی کردارەکانی قورس نەکات بەکاری چاکە.

*ئەگەر لەداری (زەقوم)ی خوارد یاخود لەچڵکاوو دەرهاویشتەکانی یان دووپشکەکانی گەزتیانو مارەکانی قووتیانداو پێستی گۆڕا بەپێستی خەڵکی دۆزەخو لەسەر ڕووبەکێشکراو بەڕوودا فرێدرایە نێو دۆزەخو بەمقاشی ئاسنینو جەللادەکانی دۆزەخ لێی توڕەبوونو خەشمیان لێگرت سەرجەم ئەو حاڵانە بەڵگەیە لەسەر:
+بیدعە لەئایندا.
+هاوبەشیکردن لەگەڵ ستەمکاراندا.
+رۆیشتن لەسەر رەوییەی بێباوەڕانو هاوڕەفتاری لەگەڵ موشریكو دووڕوانو گاڵتەکاران.
+پێچەوانەی پێغەمبەران رەفتارکردنو وازهێنان لەخواناسانو پارێزکاران.
+پاشگەزبوونەوە لەئاین.
+چرووکیو بەخیلی.
+سەرپێچی پەروەردگار، یاخود نکوولیکردن لەکردگاریو توانای پەروەردگارو چواندنی رەفتارەکانی پەروەردگار.
*بینینی دۆزەخەوانەکان بۆ یەکێك سیفەتی ئەوانی هەڵگرتبێت یاخود خواردنێکی دەرخوارد بدەن بەڵگەیە لەسەر:

+خۆشەویستی بۆ خواو پێغەمبەرو موسوڵمانان.
+شکۆمەندیو دەستەلات.
+دوورکەوتنەوە لەدووڕوویی.
+دەستبەرداربوونی گوناهو سەرپێچی.
+ڕێنموویی دوای وێڵیو سەرگەردانی.
+بوونی غیرە لەئایندا.
*ئەگەر دۆزەخەوان ڕووی تێکرد بەڵگەیە لەسەر سەلامەتیو پارێزراوی لەئاگری دۆزەخ، ئەگەر پشتی تێکرد یاخود ڕووخساری گۆڕا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوتوەتە گوناهێکەوە شایستەی ئاگری دۆزەخە.
*دۆزەخەوانەکان ئەمینو پارێزراوو پەناوپشتگیریو هاوەڵی پۆلیسو کەسوکارو خزمن بۆئەوەی دۆزەخەوان بەڵگەبێت لەسەری.
*ئەگەربینی دەچێتە نێو ئاگری دۆزەخو لێی دێتە دەرەوە پشت بەخوا دەچێتە نێو بەهەشت یاخود گوناهێك ئەنجامدەداتو پاشان تەوبەدەکات لێی.
*ئەگەربینی ئەندامەکانی لاشەی دەدوێت لەگەڵی بەڵگەیەلەسەر ڕێگرتن لەسەرپێچیو تاوانو بێداربوونەوە لەکاروبارەکانی قیامەت.

**دۆشاو(شێلراو ـ هەویر):** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر چارەسەر لەنەخۆشیو زۆری وەچەو نەوە.
**دۆشاوچی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دۆشاوچی پیاوێکی ئامۆژگاریکاری وشیارو بێدارە.
**دۆشەر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: دۆشەری مەڕو مالآت مالّو دارایی گرد دەکاتەوە، دۆشەری مانگاش پیاوێکە داوا لەکرێکاراندەکات، ئەوەشی مەڕدەدۆشێت پیاوێکی ناوبانگ باشەو لەسەر سروشتو پاکی دەڕوات بەڕێوەو مالّو دارایی حەلالّ کۆدەکاتەوەو لەهەماکاتیشدا خوازیاری زانستە.
(نابلسی)دەڵێت: بینینی دۆشەر بەڵگەیە لەسەر ڕزقو ڕۆزیو سوودو مامەڵەی خۆشو نەرم نیانی وتە، شیرودۆشەریش : پیاوێکی چاکە.
**دۆشین:** (نابلسی)دەڵێت: دۆشین لەخەودا مالّو داراییەکە بەئەستەمو ماندوبوون دەستدەکەوێت.
**دۆشینی مەڕو...:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر باشی مامەڵەو هەلّسوکەوت لەکاروکاسبیداو بەدەستهێنانی ڕزقو ڕۆزی.

*ئەگەر خزمەتکارێك مانگایەکی دۆشی هی گەورەو بەرپرسەکەیبوو هاوسەری گەورەکەی دەهێنێت.

*ئەگەر بینی مانگایەك دەدۆشیۆ لەشیرەکەی دەخواتەوە، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێتو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوە، ئەگەر دەوڵەمەندبوو دەوڵەمەندییەکەی زیاد دەکاتو شکۆمەندی رووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی حوشتر دەدۆشیٚ لەلایەن فەرمانڕەواوە ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت ، ئەگەر کاتیٚ دۆشی خوێنی لێهات لەبری شیر ماڵو داراییەکی حەرام بەدەستدەهێنێت ، دۆشینیش لەلێکدانەوەدا فرۆفێڵە ، دوشینی حوشتر کرێکارییە لەسەر زێدو خاکی عەرەبی.

*ئەگەر دۆشیو خوێنهات ناپاکی لەگەڵ دەستەڵاتدارو فەرمانڕەوایەکدا دەکات.

*ئەگەر دۆشیو چەوری لەگوانیهات ماڵو دارایی حەرام بەدەستدەهێنێت.

*دۆشین لەلێکدانەوەدا فرۆفێڵە.

*حوشتر دۆشین کرێکارییە لەوڵاتی عەرەب.

*ئەگەر بازرگانێك دۆشیو شیری لێهات رزقو رۆزییەکی حەلاڵ بەدەستدەهێنێت لەگەڵ دەستکەوتو سوود لەبازرگانیەکەیو لەدنیادا دەرووی لێدەکرێتەوە بەئەندازەی ئەو شیرەی کەدێت.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر حوشترێك بدۆشێتو لەشیرەکەی بخواتەوە بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی باشو چاکدا، ئەگەر هاوسەرداریشبوو کوڕێکی پیرۆزو فەرپداری دەبێت.

**دۆلار:** (ئەبو حەفس)دەڵێت: دۆلار لەخەودا رزقو رۆزییە ئەگەر لەکانزا دروستکرابوو، ئەگەر زۆربوو سەرچاوەکەی نەدەزانی فیتنەو ئاشووبە بەپێی ئایەتی : ﴿ انما أموالكم وأولادكم فتنة ﴾.

**دۆلفین:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا وەك بینینی تیمساح وایە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر فێڵو کاروکردارشاردنەوەو گوێهەڵخستن.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر شەونمو باران.

*هەروەها (دمیری) دەڵێت: ئەوەی لەخەودا (دۆلفین) ببینیٚ دڵنیاو قوتار دەبێت.

*هەروەها وتراوە: دوژمنێکی بێدەستەلاتە ناتوانێت زیان بگەیەنێت.

**دۆلاب :** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا گەنجینەدارە.

*هەروەها دەڵێن: دۆلاب بەڵگەیە لەسەر سەفەر ئەگەر بسوورێتەوە یاخود بگەڕێت، ئەگەر شکا یاخود وەستا بژێوی دەوەستیٚو سەفەرەکەی پووچەڵدەبێتەوە.

*کۆمەڵە دۆلابێك گۆڕان‌و گەڕانی بازرگانییە گواستنەوەی حاڵو بارە بۆ سەفەرکردن ، ئەگەر هەستێکی خۆشی دروستکرد هەواڵو دەنگو باسە یاخود خەوبینەر گوێبیستی قورئان دەبێت ، روح‌وگیانە بۆیەکێك گوێبیستیبێت.

*دۆلابی چنین‌و ئاوریشم رزقێکی باشە لەگەڵ هاوسەرگیری بۆ کەسێکی رەبەن‌و حاڵوبار جووڵاوو باش.

**دۆلچە :** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دۆلچە پیاوێکە بەفروفێڵ ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی ئاو بەدۆلچە دەردەهێنێت لەبیرێك ئاو دەخاتە دەفرێکەوە ماڵو دارایی بەفروفێڵ بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی لەدەفرێکیتردا خاڵیدەکاتەوە ئەو ماڵەی لەدەستدا نامێنێتەوە هەتا دەڕوات‌و سوودو قازانجی بەسەردەچێت، ئەگەر باخەکەی ئاودا دەچێتە لای ژنێك، ئەگەر باخەکە بەروبوومی هەبوو کوڕێکی لێدەبێت بەوچەشنەی بینیویەتی.

*ئەگەر بیرێکی کۆنی بینی حوشتری لیٚ ئاودا یاخود خەڵکێك یا ئاژەڵ باشترینکردار ئەنجام دەدات‌و باشتر لەبیرەکە بەپێی هێزو توانای خۆی، وەك شوان وایە ئاو دەردەهێنێت بۆ ئاژەڵەکانی‌و رووپامایيە بۆ ئاین‌و دنیا بەپێی هێزو توانای خۆی.

*ئەگەر بینی بۆ خۆی ئاو هەڵدەگۆزێت لەکاروکردارەکانیدا بۆ بەرژوەندی دنیا ئەنجامدەدات بەئەندازەی هێزو توانای.

*پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرموێت: "لەخەودا بینیم لەسەر بیری (قولەیب)م ئاو دەردەهێنم بۆ مەڕی رەش ، پاشان (ئەبوبەکر) دۆلچەکەی لێوەرگرتم دوو دۆلچە یان یەکێکی دەرهێنا بەڵام لەدەرهێنانیدا لاوازی هەبوو خوا لێیخۆش بێت ، دوای ئەو (عومەر)ی کوڕی (خەتاب) دۆلچەکەی

لێوەرگرتمو مەڕی سپی تێکەڵ بەمەڕی ڕەشبوو دۆڵچەکە لەدەستی (عومەر)دا روو بەرۆژئاواچوو، هیچکەسم نەدی ئەوەندی تۆ لێزانو کارامەبێت ئەی کوڕی خەتتاب"[1].

*هەروەها دەگێڕنەوە پیاوێك هاتە لای (ئیبن عەباس)و وتی: لەخەودا بینیم دۆڵچەم خستە نێو بیرەوە سێیەکی پڕبوو بەشتێکی مایەوە، ئەویش وتی: شەش مانگ، خێزانەکەت بەجێهێشتوەو ژنەکەت دووگیانبوەو، ئنجا کوڕێکی دەبێت، ئەویش وتی: بەڵگەت چییە لەسەر ئەوە؟ وتی: لەبەرئەوەی من بیرم بەژن داناوە ئەو مژدەیەشی لەبیرەکەوە هات (یوسف)بوو(سەلامی خوای لێبێت) بۆیە زانیم کوڕە ، سەبارەت بەسێبەشی دۆڵچەکە شەش مانگە سێیەکی پاشماوەش سێ مانگەکەیە، ئەویش وتی: ڕاستدەکەیت، چونکە نامەیەکم پێگەیشتوە لێوەی تیا هاتوە شەش مانگە دووگیانە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی دۆڵچە دەردەهێنێ لەبیرو خۆی پێدەشواتو

[1] (بوخاری)(٣٦٨٢)و(مسلم)لە(فضائل الصحابة) (٢٣٩٣) لەفەرمودەی (عەبدوڵڵا) ی کوڕی (عمر) (ڕەزای خوایان لێبێت).

ماڵو سامان بەدەستدەهێنێتو ئێرەیی پێدەبەن.

*ئەوەی دۆڵچەیەك بخاتە نێو بیرێکەوەو ژنێکی دووگیانی هەبێت منداڵی نێرینەی دەبێت، ئەگەر هاوسەرەکەی دووگیان نەبوو ڕزقو ڕۆزی داوا دەکات، ئەگەر لەدۆڵچەکەدا ئاو هاتە دەرەوە ڕزقو ڕۆزییە بەدەستدەهێنێت، ئەگەر شتو مەکی هەبوو لەسەفەردا پێیدەگاتو، ئەگەر نەخۆشیبوو بێدارو چاکدەبێتەوە. ئەگەر زیندانی بوو قوتار دەبێت یاخود لەپێناوی پێداویستیەکدا ڕوودەکاتە دەستەلاتدارو فەرمانڕەوایەك.

*ئەگەر بینی لەسەر لێواری بیرێك وەستاوە دۆڵچەیەکی بەدەستەوەیەو دەیەوێت ئاوی پێ هەڵبگۆزێ خێرو ماڵو داراییە بەدەستیدەهێنێت.

*دەگونجێت بیر ژن بێت ، چونکە بیر (مؤنث)ە ئەگەر ئاو هەڵکێشن بەدۆڵچە خوازیارو داواکاری زانیارییبوو بیرەکە مامۆستایدەبێت کەسوود لەزانیارییەکەی وەردەگرێت ئاوی هەڵگۆزراو بەشو بەختو چارەیە.

**دۆڵوشیوو**:(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر سەفەری ناڕەحەت یان

مرۆڤێکی رەزاقورس وگران یان سەفەرێکی دوورودرێژ.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر کاری چاکەو لەپەروەردگار نزیکبوونەوە بەخێر.

*دەگونجێت دۆڵ و شیوو بەڵگەبێت لەسەرئەوەی نیشتەجێیە تێدا یان ئەوەی تێدا دەچێنرێ یاخود تێدایە لەدارو درەخت و گوڵ یاخود بۆنی خۆش و ئاو ، یان وتەیەکی باشی تیادەبیستێ و پلەوپایەی دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر مرۆڤێکی باشبوو کاری لەرادەبەدەر لەسەر دەستی دەردەکەوێت بەپێی ئایەتی: ﴿ فلما أتاها نودي من شاطيء الوادِ الأيمن﴾ (القصص: ٣٠).

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دابەزینی باران و لەبەر رۆیشتنی ئاو.

*دەگونجێت کەوتنە نێو دۆڵەوە بەڵگەبێت لەسەر هەڵگرتنی نامە بۆستەمکاران، بەپێی ئایەتی: ﴿ اذ ناداه ربه بالوادي المقدس طُوى ، اذهب الى فرعون انه طغى﴾ (النازعات: ١٧).

*دەگونجێت دۆڵ وشیوو بەڵگەبێت لەسەر زیندان.

*ئەگەر بینی لەدۆڵێکدا مەلەدەکات تا دەگات بەشوێنی خۆی دەیەوێت کارێکی دەستەڵاتدار ئەنجامبدات، ئەگەر ترسا لێی لەدەستەڵاتدارەکەی دەترسێ.

*دۆڵ و شیو بەڵگەیە لەسەر جەنگاوەری رێگرو جەربەزەو ئازا.

*ئەگەر دۆڵێکی بینی کەوتە نێوانی خۆی و رێگەیەك ئەگەر موسافیربوو دز یان هۆکاری خراپ دەبێت بەرێگر لێیان، ئەگەر لەسەفەردا نەبوو غەم و پەژارەو بەڵاو نەهامەتی رووی تێدەکات بەهۆی زیندانی و لێدان و ترس وبیمەوە، یاخود نەخۆشی و سەرما دەیگرێتەوە.

*ئەگەر دۆڵێکی هەڵکەند یەکێك لەئەندامەکانی خانەوادەکەی دەمرێ.

*دۆڵ و شیوو بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی پێداویستی بۆیەکێك بیەوێت لێی بێتەدەرەوە.

*ئەگەر بینی کەوتە شیوێك بەڵام ئێش و ئازاری پێنەگەیشت سوودو قازانجی دەستگیر دەبێ لەخەڵات یاخود دەستەڵات لەلایەن فەرمانڕەواوە.

*ئەگەر بینی لەنێو دۆڵ و شیوێکدا نیشتەجێبوو دۆڵەکە بێکشتوکاڵبوو (حەج)دەکات.

*ئەگەر بینی عەودالو شەیدابوو لەدۆڵێکدا شیعرو هۆنراوە دەخوێنێتەوە.

**دە**

**دەباخخانە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا وەك قەسابخانەو شوێنی کوشتاری ئاژەڵ وایە بەهۆی بوونی ئاوو بۆگەنی پێستەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانیاریو هاوچەشنی ئەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنێکی فرە رەنجبەرو ئارامگر لەسەر نارەحەتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنێکی توندوتیژو رەوشت زبرو رەق. یان سووكو رسوایە ئالوودەی خراپە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵوسامان.

**دەباخچی:** (نابلسی)دەڵێت: خۆشکەری پێستەی ئاژەڵ ، بەڵگەیە لەسەر کەڵەشاخ بەهۆی ئەوەی کەڵەشاخ گرتن چارەسەری تێدایە لەهەندێك نەخۆشی.

*ئەگەر بینی پزیشکێك بووە بەدەباخچی بەڵگەیە لەسەر زیرەکی ئەو پزیشکەو چارەسەر وەرگرتنی چەندین کەس لەسەر دەستی مەگەر دەباغەکەی بەبۆگەنکردووی ببینێ ئەوجا نەزانو گوێ پێنەدەرە.

*ئەگەر دەباخچێتی بەڵگەبێت لەسەر کاروبارێکی دنیا لەتیاچوونو فەوتان قوتار دەبێت، ئەگەر بەڵگەبێت لەسەرکاروبارێکی ئاینی هەژارێك تێردەکات لەکاتی نەبوونیدا.

*دەباخچی پیاوێکی چاکسازە یاخود پزیشکە یان هەڵسوکەوتدەکات بەمیراتی پاشماوەی خەڵکی فەوتاوەوە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارە.

*دەباخچی پیاوێکی ستەمکارە.

**دەبدەبە:** (نابلسی) دەڵێت لەخەودا پیاوی دەوڵەمەندی بازرگانە، خەڵکی بۆیان دەڕوانن بەهۆی گرتنی پارەوپوولو رەزیلیانەوە.

*ئەگەر لەبەر دەرکی ماڵی خۆیاندا دەبدەی بینی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی لەنێو عەجەمدا بەدەستدەهێنێت.

**دەجال:** (نابلسی) دەڵێت: دەجال لەخەودا دەستەڵاتدارێکی ستەمکاری قۆڵبڕە ئەو بەڵێنەی دەیدات جێبەجێی ناکاتو شوێنکەوتەکانی خراپن.

*هاتنی دەجاڵ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زاڵبوونی دوژمنو بڵاوبوونەوەی

بەسەر زەویداو دەرکەوتنی کاری خراپ لێی وەك خوێنرێژیو فیتنەو ئاشوب.

*ئەگەر خەوبینەر لەسەفەردابوو ڕێگەی لێدەگیرێ.

*بەلگەیە لەسەر ئاوەلاکردنی شارێکی بێباوەڕان.

*بینینی بەلگەیە لەسەر جادوو درۆو دەردو نەخۆشی بۆ یەکێك هاوەلایەتی بکات لەخەودا یاخود بچێتەسەر سیفەتی ئەو.

*دەرکەوتنی دەجال لەخەودا دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر چاکبوونی بارو حالی جوولەکە دواتر خوداوەند لەناویاندەبات.

*ئەو شوێنانەی لەخەودا پێدا تێپەڕ دەبێت بەلگەیە لەسەر غەمو پەژارەو ستەم.

**دەراج**[1] : (ئیبن سیرین) دەلێت: کەسی خاوەنداره یان ژنێکی فارسیه.

(نابلسی)دەلێت: ئەگەر بینی بالندەی (دەراج)ی هەلگرتووە ژنێکی فارس دەهێنێت یان مالو دارایی لێدەستدەکەوێ.

*پیاوێکی ناپاکی غەددارە.

*ئەگەر بینی چارەسەری ئەو جۆرە بالندەیە دەکات پیاوێکی لەو چەشنە چارەسەر دەکات.

*ئەگەر بینی بالندەیەکی لەو چەشنەی بەدەستهێناوە دەچێتە لای ژنێکی ناپاکی قۆلبڕ هیچ خێرێکی تیا نییە.

**دەرپێ**:(نابلسی) دەلێت: بینینی دەرپێی پادشا لەخەودا بەلگەیە لەسەر پیاوێکی کاروبارو ڕێکخەرو مشورخۆر.

**دەرخستن( ئاشکراکردن )**:(نابلسی) دەلێت: دەرخستنی ئەوەی کەدەبێت بشاردرێتەوە دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر دەرخستنی خێر، دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر بەرزکردنەوەی یادو زیکرو پلەوپایەی بەرز.

**دەرزی ( شرینقە )**:(ئیبن سیرین)دەلێت: ئەگەر بینی دەرزی لێدەدرێت بەهۆی نەخۆشیەکەوە لەکاروکردارێك پاشگەدەبێتەوە چاکەی ئاینەکەی تێدایە.

*ئەگەر بەبێ ئەوەی نەخۆش بێت دەرزی لێدرا لەنەزرو پێویستگێرانێك پاشگەز دەبێتەوە یاخود وتەو حالێك کردوویەتی.

**دەرکردن**:(ئیبن سیرین) دەلێت: دەرکردنی پیاو لەبنکەو جێی

---

[1] **دەراج**: بالندەیەکی رەشە لەقەتێ دەچێت بەلام لەو نەرمو نیانترە.(فەرهەنگی دەریا)

نیشتەجێبوونی بەڵگەیە لەسەر قوتارو رزگاربوونی لەخەمو خەفەت.

*دەگێڕنەوە پیاوێك لای یەكێك لەوانەی خەو لێكدەداتەوە دەڵێت: لەخەودا بینیم دراوسێكانم لەماڵەكەم دەریانكردم.. ئەویش وتی: دوژمنداریت؟ وتی: بەڵێ ، ئەی مرۆڤ كاتێ خەمو خەفەتی دەبێت دوژمندار نییە ؟ وتی: بەڵێ ، ئنجا وتی: مژدەبێت خوداوەند قوتارو رزگارت دەكات لەشەڕی هەموو دوژمنێكو سەرجەم خەمو خەفەتت لەسەر لا دەبات ، بەڵگەی ئەمەش وتەی پەروەردگارە كاتێ دەفەرموێت: ﴿أَخْرِجُوا آلَ لُوطٍ مِنْ قَرْيَتِكُم إِنَّهُم أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ، فَأَنْجَيْنَاهُ وَأَهْلَهُ﴾(النمل).

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا زیندانیو بەندكردنە، ئەگەر بینی لەوڵاتی خۆی دەردەكرێ زیندانیدەكرێ.

*ئەگەر بینی لەبەهەشت دەركرا هەژاردەكەوێ.

*ئەگەر بینی زانایەكی دەركرد یاخود دەنگی بەرزكردەوە بەسەریدا دەكەوێتە حاڵو بارێكی گەورەوە.

*دەركردن بۆ یەكێك بەڕووكەش دینداربێت بەڵگەیە لەسەر نكوولیكردن لەگوێڕایەڵانو وەرگرتنی لەرێزدارانو رووتێكردنیان.

*هەروەها دەگونجێت ناتەواویەك بێت لەدەركراودا.

**دەركەوت ( سەریهەڵدا )**: (نابلسی) دەڵێت: دەركەوتنی دارخورما لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزیو دووكیانبوونی هاوسەر، ئەگەر نەخۆشێك بینی بەڵگەیە لەسەر چاكبوونەوەی.

*دەگونجێت دەركەوتنی دارخورما بەڵگەبێت لەسەر مەرگی نەخۆش یان هەڵگرتنی كاڵاوشتومەكو پەسمەندەكردنی.

*ئەگەر بینی دارخورمایەك یان دوان زیاتری بینی ئەگەر لێی خوارد لەماڵی كوڕەكەی دەخوات.

*ئەگەر دارخورمای لێدەركەوت ئەستێرەی بەختی روو هەڵهاتندەكات، ئەگەر دارخورماكە زەردبوو لێینەخوارد دەستەڵاتدار لێی توڕەدەبێ پاشان رازیدەبێتەوە لێی.

*دەركەوتنی دارخورما ماڵو سامانە بەدەستیدەهێنێت.

**دەرگا**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەرگای ئاوەڵاكراو دەروازەكانی رزقو رۆزییەو

دەرگای ماڵیش چاودێرو سەرپەرشتیاریەتی.

*ئەگەر بینی لەناوەندی ماڵەکەیدا دەرگایەکی بچووك هەیە رووداو کارەساتێکی ناخۆش رووددات ، چونکە روودەکاتە خەڵکی عەیبو عار دادەپۆشێتو عەیبو عاریش لەرووی هاوسەرەکەیەوە روی تێدەکات.

*دەرگای ماڵان واتە ناتەواوی روو لەژنان دەکات ئەگەر هەڵچنرابوو کچن ، ئەگەر دەرگای پێوە نەبوو یان دانەخرابوو بێوەژنن.

*ئەگەر بینی دەرگای ماڵێك خەریکە دەکەوێت یاخود دەردەهێنرێو فڕێ دەدرێتە دەرەوە یان سووتاوەو شکاوە بەڵاو نەهامەتیەك روودەکات لەخێوکەری.

*ئەگەر دەرگای ماڵەکەی گەورەبوو یان فراوانبوو یان بەهێزو تۆکمەبوو حاڵو باری بژێوی پەیداکاری ماڵەکەی باشدەبێت.

*ئەگەر بینی بەرووی دەرگای ماڵەکەدا دەگەڕێتو نایدۆزێتەوە سەرسامو دوودڵە لەکاروباری دنیادا.

*ئەگەر بینی لەدەرگایەکەوە چوە ژوورەوەو لەبێداریشدا ئاژاوەو ناکۆکی هەبوو زاڵدەبێت بەپێی ئایەتی ﴿ادْخُلُوا عَلَيْهِمُ الْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَالِبُونَ﴾ (المائدة: ٢٣).

*ئەگەر بینی دەرگاکان لەچەن لایەکەوە کرابوەوەو یان نادیاربوو دەروازەکانی دنیا لەبەردەمیدا ئاوەلا دەکرێت ئەگەر سنوورەکەی نەبڕی ئەگەر بڕی ماڵەکە وێرانو کاولدەبێت.

*ئەگەر دەرگاکان روو بەرێگەیەك بوون لەدنیادا بەدەستدەهێنێتو روودەکاتە غەریبو خەڵکی گشتی، ئەگەر کرابوەوە لەسەر ماڵێك ئەوەیەکە بۆخانەوادەکەی بەدەستی دەهێنێت.

*ئەگەر بینی دەرگای ماڵەکەی ئاوەڵاو فراوانبووە زیاد لەئەندازەی خۆی رووتێکردنی کەسانێکە کەخەوبین پێیان رازی نییە .

*دەگونجێت لاچوونی دەرگای ماڵ لەشوێنی خۆی گۆڕانی بەرپرسی ماڵ بێت سەبارەت بەخانەوادەی.

*ئەگەر بینی لەدەرگایەکی تەنگەبەرەوە هاتە دەرەوە روو بەشوێنو جێگەی فراوان دەرچوونو قوتاربوونیەتی لەتەنگەبەرییەوە بۆ ئاوەلایی و فراوانی یان لەخەمو پەژارەوە بۆ دەروولێکردنەوە.

*ئەگەر بینی ماڵەکەی دوو دەرگای هەیە ژنەکەی بەدڕەوشتو داوێن پیسە.
*ئەگەر بینی دەرگاکەی دوو ئەڵقەی هەیە قەرزی دووکەسی لایە.
*ئەگەر بینی ئەڵقەی دەرگاکەی دەرهێنا روو لەگەڵو نەتەوەو کۆمەڵێکی بیدەعەچی دەکات.
*داخستنی دەروازەی ماڵیش بەلاو نەهامەتی گەورەیە روو لەخانەوادە دەکات.
(نابلسی)دەڵێت: ئەڵقەی دەرگا وەك دەرگاوان یان پێغەمبەرو فرستادە وایە، ئەوەی ببینێ ئاگر بەردەبێت لەدەرگاکان بەڵگەیە لەسەر مردنی هاوسەری پیاو هەروەها بژێوی‌و مووچەی باش نییە.
*دەرگاکانی شار بەڵگەیە لەسەر پادشاو فەرمانڕەوای بەرپرسی دنیاو قیامەت.
*دەرگای ماڵیش بەڵگەیە لەسەر بنیادنەرو بەرپرسی خانەوادە یان ئەوانەی نیشتەجێبوون‌و دەیانگرێتەخۆ لەژن‌و کچ.
*چوونە ژوورەوەش لەدەرگای نادیارەوە بەڵگەیە لەسەر زاڵبوون‌و سەرکەوتن بەسەر دوژمندا.

*دەگونجێت دەرگای نادیار بەڵگەبێت لەسەر زانیاری‌و رزق‌و رۆزی‌و سەفەر لەگەڵ کردنەوەی دەروازەی خێر یان شەڕ، ئەمەش بەپێی ئەندازەی خەوبینەر، دەرچوونیش لەدەرگاوە وازهێنانە لەوەی باسمانکرد، ئەگەر دەرگاکە چاكو باشبوو بەڵگەیە لەسەر وازهێنان لەخێرو چاکە، ئەگەر شکاوو تەنگەبەربوو لەدەروازەی شەڕو خراپەوە بەدەردەکەوێت بۆ رزگاری‌و سەرفرازبوون.
*دەگونجێت دەرگا بەڵگەبێت لەسەر مردن.
*ئەگەر لەدەرگاکە بەدەرکەوت‌و پاشان فراوانی‌و سەوزی‌و بۆنی خۆشیکرد بەڵگەیە لەسەر چارەنووسی دوایی هاتنی بەخێرو چاکە، بەلام ئەگەر تاریکایی‌و کەلاك‌و ئاگری بینی لەقیامەتدا بەوە سزا دەدرێت.
*ئاوەلاکردنی دەرگا لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئاسانکردنی کاروبار، داخستنیشی ناخۆشی ژینەو پووچەڵکردنی هۆکارەکانە.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر چارەنووس‌و عاقیبەت باشی.

*کردنەوەی دەرگا لەئاسماندا بەڵگەیە لەسەر وەڵامدانەوەی دوعا یان ڕێگری لەبەجێهێنانی کاروباری مەترسیدار.
*هەروەها کردنەوەی دەرگا بەڵگەیە لەسەر درێژبوونەوەی سزاو ئەشکەنجەو تۆڵەو ناڕەحەتی.
*ئەگەر باران نەباری بارانبارینو بوژانەوەی زەوییە.
*دەرگای نهێنیو پەنهانی ماڵیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خەوبینەر دەیگرێتەخۆ لەشەڕو چاکە، ئەگەر دەرگاکە شاراوەو باشبوو دەگات بەویستو خوازی خۆی.
*ئەگەر لەدەرگاکەوە بەدەرکەوت بەڵگەیە لەسەر بەدەرکەوتنی نهێنیەکانی.
*دەگونجێت دەرگا بەڵگەبێت لەسەر مەزنیو بەرزی یان خزمەتکارو بەردەستو منداڵ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خێر بەنهێنیو بەخۆشی مامەڵەکردن لەنێوان خۆیو پەروەردگاریدا.
*ئەوەی ببینێ دەرگای ماڵەکەی نوێیە یان دارتاشێك ببینێ ڕێکیدەخات یان دایبنێ بەڵگەی لەشساغیو تەندروستی باشە.

*ئەوەی ببینێ دەیەوێت دەرگاکە دابخات بەڵام ناتوانێ کارێکی قورسەو ناتوانێ بەهۆی ژنەکەیەوە ئەنجامیبدات.
*ئەوەی ببینێ لەدەرگایەکەوە دەچێت بۆ لای کۆمەڵێك زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیداو، بەبەڵگەکانی شکست بەدوژمنەکانی دەهێنێت.
*ئەوەی دەرگایەکی هەڵگەڕاوە ببینێو یەکێکیتر دایبنێ ماڵەکەی دەفرۆشێت.
*ئەوەی بچێتە نێو ماڵێكو دەرگاکەی دابخات لەگوناهو تاوان پارێزراو دەبێت.
*بینینی دەرگای دوو ئەڵقە دوو قەرزارن داوای قەرزیان لێدەکرێتەوە.
**دەرگاشکێن:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر دەرگاوان.
**دەرگاوان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەرگاوانی فەرمانڕەوا ئاگادارییە، ئەوەی دەرگاکانی میرێك ببینێ دەستەڵاتو فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی مەزنی دەستەڵاتدارەو هیچ کەس لای فەرمانڕەوای باڵا لەو زیاتر قسەوکاری ناڕوات، ئەگەر لەخەودا بینی بوە بەدەرگاوان یان کچێکی کڕیوە

دەستەلاتێکی مەزن وەردەگرێت لەکەسێکی نزیکیەوە بەهۆی نزیکی لەفەرمانڕەواوە.

* ئەوەی ببینێ بووە بەدەرگاوانی پادشاو فەرمانڕەوا پارەبەقەرز دەدات.

**دەرگاوانی پادشا:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر پادشایەك دەرگاوانەكانی بەپێوەبینی لەمامەڵەو سیاسەتدا بەپێوە دەبن، ئەگەر بەدانیشتنەوە بەدیکرن کەمتەرخەمی لەکاروباری خۆیاندا دەکەن.

* دەرگاوانی پادشا مژدەیە، هەروەها پیاوێکی مەزنی رێزدارەو راوێژی پێدەکاتو کاروباری بەرزو نزمی پێدەسپێرێ.

* هەروەها بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هۆ هێنانەوە.

**دەرمان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەموو شەرابێکی زەرد لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی ، هەموو دەرمانێکی خۆش قوت بەڵگەیە لەسەر چارەسەری نەخۆشو خۆبەدوورگرتن لەزیانو خراپە.

**دەرمانەوان:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی ئەوکەسەی کەدەرمان کۆدەکاتەوەو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی زاناو دانەری چەندین کتێب.

**دەرمانی خراپو ناخۆش :** دەرمانی خراپو ناخۆش گەر خۆش قووت نەچێت نەخۆشییەکی ئاسانەو دواتر خاوەنەکەی چاکدەبێتەوە.

* شروبو خواردنەوەی بەخۆشیو ئاسانی بۆ دەوڵەمەند باشترە بەڵام بۆ هەژاران خراپە چونکە چاوی تێنابڕن مەگەر بەهۆی نەخۆشیەوە کەتووشیان دەبێتو ناچار دەبن بیخۆنەوە.

(نابلسی)دەڵێت: دەرمان لەخەودا چاکییە لەئایندا ئەوەی دەرمانێك بخواتەوە هەتا لەشو لاری پێچاك بێت ئاینی چاكو باشدەكات.

* ئەگەر دەرمانێك بخوات لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زانیاری ، ئەگەر نەیخوات لەحەق لادەداتو لەسەر وێڵیو سەرگەردانی خۆی بەردەوام دەبێت.

* ئەگەر لەخەودا دەرمانێکی بۆنداری خواردو زۆر بەتامو چێژبوو بەڵگەیە هاوسەر بۆکەسێکی رەبەنو بۆکەسێکی نەزۆکیش منداڵەو بۆ هەژار دەوڵەمەندییە.

* دەگونجێت دەرمان بەڵگەبێت لەسەر شووشەی مەرەكەبو مەرەكەبیش بەڵگەبێت لەسەر چارەسەرو دەرمان.

*موغەزیو چارەسەری هەڵواسراو زۆرکردنە لەکەسێکی سەرپێچیکار لەسەر ئەوەی تەوبە بکاتو بۆ بێباوەڕیش ڕێنومایییەو بۆ نەزان زانیارییە.

*ئەوەی ژنان خۆیانی پێدەڕازێننەوە بۆ کەسی رەبەن هاوسەرەو بۆ نەزۆك کوڕە.

*ئەگەر بینی دەرمانێکی سکشۆری دەخوات هەتا لەنەخۆشییەکەی چاکبێتەوە ئاینەکەی بەئەندازەی هێزو توانای مەترسی ئەو دەرمانە دەبێت.

*ئەگەر بینی بەدووی لەشساغیدا وێڵە لەچارەنووسیدا دنیای خۆی چاکدەکاتەوە.

*ئەگەر بینی چاوەکانی چارەسەردەکات ئاینی چاکو باشدەکات.

**دەروونتەنگی( بێتاقەتی )** : (نابلسی) دەڵێت: دەگونجێت لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی یان مەرگ بەپێی ئایەتی: ﴿ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضاً يَسِيرًا﴾ (الفرقان: ٤٦).

**دەریا** : (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەریا بەڵگەیە لەسەر هەریەکێك کەدەسەڵاتو فەرمانڕەوایی هەبێت بەسەر خەڵکیدا وەك پادشاو دەستەڵاتدارو فەرمانڕەواو زاناو گەوەو بەرپرسی ژنان بەهۆی هێزو دەستەڵاتو مەترسیداریو بەخشینو بردنیەوە بەهۆی شەپۆلەکانیو سەرجەم جموجووڵەکانی لەخۆی گرتووە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دنیاو مەینەتیەکانی کەیەکێك پلەدار دەکاتو ئەوی دی نزمو رسوا، یان دەبەخشێ بەیەکێكو ئەوی دی هەژارو نەدار.

*کەشتیەکانی دەریا بازاڕو وەرزی بازرگانییە.

*گەشتو سەفەری دەریا هەژارو دەوڵەمەندکردنی خەڵکییە.

*بایەکانی دەریاش رزقو رۆزیو رووداوەکانیەتی لەگەڵ ماسیو سەرجەم پێکهاتەکانی کەلەخۆیگرتووە لەگەڵ پادشاو فەرمانڕەواو دزو خەمو خەفەتو فیتنەو ئاشوبەکانی.

*دەگونجێت دەریا بەڵگەبێت لەسەر فیتنەو ئاشوبی هەڵگیرساو، کەشتیەکانیشی پاراستنی خوداوەندبێت بۆ ئەوانەی دەستدەگرن بەڕێبازی خوداوەو ماسیەکانی خەڵکی گوناهکارین گەورەیان بەزەیی بەبچووکیاندا نایەتەوەو دەیخۆن، گیاندارەکانیشی سەرکردەو

بەرپرسەکانن یان خەڵکی شەڕەنگێزو ئاژاوەچین.

*دەگونجێت دەریا بەڵگەبێت لەسەر دۆزەخو کەشتیەکانی وەك ڕێگەی ڕزگاریی وابێت و قوتاربوو لەگەڵ خنکاو شەپۆلەکانیشی کڵپەبێت.

*ئەوەی خۆی لەدەریادابیبینێ یان لەدەریابینی ئەگەر مردووبێت دۆزەخیە بەپێی ئایەتی ﴿أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَاراً﴾(نوح:٢٥)ئەگەر نەخۆشبوو نەخۆشیەکەی سەختو گراندەبێت.

*ئەگەر لەدەریادا نوقمبوو بەو نەخۆشیەوە دەمرێت ، ئەگەر نەخۆخش نەبوو خۆی لەفەرمانڕەوایی و دەستەڵات هەڵدەقورتێنێ.

*ئەگەر لەوەرزی هاویندا چوە نێو دەریاو لەکاتی هێمنی دەریادا لەزانستو زانیاریدا ڕۆدەچێتو لەگەڵ زانایان تێکەڵ دەبێتو بازرگانی و ماڵو داراییەکەی فراواندەبێت بەپێی مەلەکردنی لەدەریادا یان بوونی ماڵو دارایی.

*ئەگەر نوقمبوو لەدەریاداو نەمرد یان خەمو پەژرە نەهات بەسەریا لەحاڵو باری خۆیدا ڕۆدەچێت ، ئەگەر مردیش ئاینی تێکدەچێو نیەتی خراپدەبێت سەبارەت بەمەبەستو مەرامی بەهۆی کۆبوونەوەی مردنو نوقمبوون بەیەکەوە.

*ئەگەر لەزستاندا مەلەیکرد لەدەریادا کاتی سەرما یاخود هورووژانی شەپۆلەکانی لەلایەن دەستەلاتدارەوە بەلاو نەهامەتی رووی تێدەکات لەزینندانی و ئەشکەنجەدان یاخود نەخۆشیو لەشبەباری رووی تێدەکات، یان فیتنەو ئاشوبێکی بەزیان رووی تێدەکاتو تیایدەبات. ئەگەر ڕاستەوخۆ نوقمبوو لەشوێنو جێی خۆی دەکوژرێت یان ئاینەکەی تێکدەچێ بەهۆی فیتنەو ئاشوبەوە.

*ئەوەی لەئاوی دەریا بخواتەوە ماڵو دارایی کۆدەکاتەوە یان لەدنیادا دەستکەوتی دەبێت.

*ئەوەی ببینێ دەچێتە نێو دەریاوەو لەناوەڕاستیدا ڕۆدەچێتو دەستی دەگات بەقوڕو لمی خەمو خەفەت لەلایەن فەرمانڕەواوە رووی تێدەکات.

*ئەوەی دەریا یا ڕووبارێك ببڕێت خەمو خەفەتو ترسو بیم دەگوزەرێنێو بەسەلامەتی ڕزگاریدەبێت.

*هەندێك دەڵێن: ئەوەی دەریا ببینێ بەئومێدو ئاواتی خۆیدەگات، ئەوەشی

ببینێ روو لەدەریا دەکات کاری فەرمانڕەوا دەگرێتە دەستو مەترسی روی تێدەکات.

* ئەگەر ئاوی دەریای خواردەوە دەبێت بەخاوەنی ماڵو دارایی‌و تەمەنی درێژدەبێت یان ماڵو دارایی هاوچەشنی فەرمانڕەوا بەدەستدەهێنێت یان دەستەلآتی وەك ئەو یاخود هاوتاو هاو شێوازی ئەو دەبێت.

* ئەگەر لەئاوەکەی خواردەوە هەتا تێربوو لێی ماڵو دارایی هاوچەشنی ماڵو دارایی فەرمانڕەوا بەدەستدەهێنێتو تەمەن درێژ دەبێت.

* ئەگەر ئاوی لەدەریا هەڵگرت لەفەرمانڕەواوە کاروپیشەی دەستدەکەوێت بەئەندازەی هەڵگۆزینی ئاوەکە.

* ئەگەر ئاوی لەدەریا هەڵگۆزی‌و لەدەفرێکی تردا رۆیکرد لەفەرمانڕەواو دەستەلآتدارەوە ماڵو داراییەکی بێشومار بەدەستدەهێنێت یان خوداوەند حاڵو بارێکی پێدەبەخشێ ماڵو دارایی تیا کۆدەکاتەوە ، دەگونجێت ئەو حاڵو بارەش دەوڵەت بێت کەلەدەریا فراوانترو بەرینترە چونکە دەوڵەت خەلآتو بەخششی خودایە.

* ئەوەی لەئاوی دەریا خۆی بشوات لەگوناهەکانی پاكو بێگەرد دەبێتەوەو خەمو پەژارەی بەدەستەلآتو فەرمانڕەوایی دەڕەوێتەوە.

* ئەوەی لەدوورەوە دەریا ببینێ کارەساتو ناڕەحەتی دەبینێ هەروەها دەڵێن: ئومێدو هیواکانی بۆ دێتە پێش.

* هەروەها بینینی دەریا بەهێمنی باشترە لەبینینی بەهەڵسانو شەپۆلو تەوژمەوە.

* دەریاچکەش بەڵگەیە لەسەر ژنێك خوازیارو ئاواتەخوازی جوتبوونبێت چونکە دەریاچە وەستاوەو لەبەری ناڕوات، شەپۆلەکانیش سزاو ئەشکەنجەیە بەپێی ئایەتی: ﴿وإذا غشيهم موجٌ كالظُلَلِ﴾ (لقمان: ٣٢) یاخود پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وحالَ بينهما الموج﴾ (هود: ٤٣).

* دەگێڕنەوە بازرگانێك لەخەودا بینی بەدەریادا دەڕوات زۆر ترساو خەوەکەی بۆ راڤەکارێکی خەو گێڕایەوە ئەویش وتی: ئەگەر سەفەر بکەیت خێرو چاکە رووت تێدەکات چونکە خەوەکەت بەڵگەیە لەسەر جێگیربوونی کاروبارەکانت.

*پیاوێکیش بینی ئاوی دەریا ڕۆچوو بەنێو زەویدا بەئەندازەیەك كەمیكرد تا ئەملاولاكەی دەكەوت ئەم خەوەی بۆ (ئیبن مەسعەدە) گێڕایەوە ئەویش وتی: بەڵاو نەهامەتی ڕوودەکاتە زەوی لەلایەن فەرمانڕەوا یان قاتو قڕیو تالاَنو بڕۆ ڕوودەکات لەفەرمانڕەوا، ئەوەندەی بەسەرا تێپەڕنەبوو فەرمانڕەوا کوژراو ماڵەکەی تالاَنو بڕۆکراو قاتو قڕیو ڕوویکرد لەشاران.

*ئەوەی ببینیٚ لەدەریا دوڕو مەرجان دەردەهێنێت ماڵو دارایيو هاوسەری باشو زانستی دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر بینی ئاوی دەریا یان ئاویتر زیادیکرد بەڕادەیەك لەسنوورو ئاستی خۆی لایداو هەڵچوو گەیشتە نێو ماڵانو خەڵکەکە لەلێواریدا نوقمبوون ئەوا نزیکە فیتنەو ئاشووبی گەورە ڕوویان تێبکات.

*لەبنەڕەتیشدا ئاو خەمو خەفەتو فیتنەیە چونکە پەروەردگار هەڵچوونو بەرزبوونەوەی ئاوی بەیاخیبوون داناوە.

*هەروەها (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەریا لەخەودا بەڵگەیە لەسەر موڵكو دەستەلاَتێکی بێشومارو مەزنی دادپەروەر کەخەڵکی پێویستیان پێیەتی.

*دەریا بۆ بازرگان کالاَیەو بۆ کرێگرتەش مامۆستایە.

*ئەوەی دەریا ببینیٚ بەئومێدو ئاواتی خۆیدەگات، ئەوەشی ببینیٚ دەچێتە نێو دەریا ڕوودەکاتە فەرمانڕەوایەك کەهەمان سیفەتو تایبەتمەندی دەریای لەخۆگرتووە.

*ئەوەی ببینیٚ لەسەر دەریا پاڵکەوتوە یان دانیشتوە تێکەڵ بەکاروباری فەرمانڕەوا دەبێت.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی لەئاوی دەریا بخواتەوە فێری ئەدەب دەبێت بەئەندازەی خواردنەوەی لەئاوی دەریا، ئەگەر دەریای بڕی ماڵو داراییەکی زۆری بەدەستدەکەوێت وەك نەوەی (ئیسرائیل) کاتیٚ دەریایان بڕی ماڵو دارایی (فیرعەون)یان دەستکەوتو بۆ بەجێما.

*ئەگەر بینی ئاوی دەریا دەچێتە نێو گەڕەکێكو خەڵکەکەی زیانیان پێناگات دەستەلاَتدارێك ڕوو لەوشوێنە دەکات خەڵکەکەی بەهۆی ئەوەوە ڕزقو ڕۆزیان بەدەستدەکەوێت.

*ئەوەی ببینێ لەسەر دەریا وەستاوە لەفەرمانڕەواوە دەستکەوتێکی دەستدەکەوێت چاوەڕێی نەبوە.
*ئەوەی ببینێ ئاوی دەریا کەمدەکات دەسەلاتی دەسەلاتدار روو لەکزیدەکاتو لەو شارانە دەکشێتەوە کەئاوی تیا نەماو خەڵکی خێرو خۆشی روویان تێدەکات.
*ئەوەی ببینێ خۆی بوە بەدەسەلاتدار ئەگەر نەخۆشبوو نەخۆشیەکەی توندو سەخت دەبێت، ئەوەشی ببینێ دەچێتە نێو دەریاوە پاشان لێی بەدەر دەکەوێت پشکێ لەدەسەلات بەدەستدەهێنێتو بەو ئەندازەیە خەمو پەژارەی دەرەوێتەوە.
*ئەوەی ببینێ بەمەلە لەدەریا دێتە دەرەوە ئەگەر نەخۆشبێت پەروەردگار شیفاو چارەسەری دەدات، ئەگەر بەهۆی فەرمانڕەواوە لەخەمو پەژارەدابوو قوتار دەبێت لێی.
*ئەگەر بەمەلە قوتاربوو لەدەریا زۆر نامێنێتەوەو لەو حاڵە قوتار دەبێت.
*ئەوەی ببینێ دەچێتە نێو دەریاوە بەمەلەو ونـدەبێت تێیدا تیادەچێتو دوایی دێت.
*ئەوەی ببینێ لەئاوا نوقمدەبێت بەشەهیدی دەمرێت چونکە نوقمبوون لەئاودا بەشەهیدی دانراوە ، هەروەها دەڵێن: گوناهو تاوانەکانی دەسرێتەوە.
*ئەوەی ببینێ لەدەریادا نوقمدەبێت وەك ئەوەی بەسەر ئاوەکەوەو دەچێتەوە ژێری بەلام نەمرێت لەکاروباری دنیادا رۆدەچێت، دەگونجێت نازو نیعمەتێك بەدەستبهێنێت یاخود فرە تاوانو گوناه بێت.
*ئەوەی ببینێ لەدەریادا رۆچوە لەسەر دوڕو مەرجانێك خوازیاری ماڵو داراییە.
*ئەوەی ببینێ ئاو لەدەریا هەڵدەگۆزێو دەیکاتە نێو کەشتیەکی لەنگەرگرتوو و پڕیدەکات کوڕێکی تەمەندرێژی دەبێت.
*ئەوەی ببینێ ئاو لەدەریا هەڵدەگۆزێو دەیخواتەوە لەپلەوپایەکەی خۆی ماڵو دارایی بەدەستدەکەوێت یان زانیاریەکی بەدەستدەکەوێت بەبڕی خواردنەوەی بۆ ئاوی دەریا. ئەگەر ئاوەکە لێڵبوو ترسو بیم رووی تێدەکات.
*ئەوەی ببینێ خۆی دەشوات یان دەستنوێژ دەگرێت لەئاوی دەریادا ئەگەر نەخۆشبوو خوداوەند چارەسەریدەکات، ئەگەر قەرزاربوو

قەرزەکەی دەداتەوە، ئەگەر خەم پەژارەداربوو دڵنیادەبێت لەو ترس و بیمەی رووی تێدەکات، ئەگەر لەزینداندابوو قوتارو ئازاد دەکرێت و روو لەخێرو چاکەدەکات.

*ئەوەی ببینێ بەسەر ئاودا دەڕوات لەدەریایەکدا بەڵگەیە لەسەر نیەت باشی و بوونی دڵنیاییەکی دروست و شیاو.

*هەروەها دەڵێن: رۆیشتن بەسەر ئاودا بەڵگەیە لەسەر بەدەرکەوتن و ئاشکرابوونی کاروبارو رووداوی نهێنی، هەروەها بەڵگەیە لەسەر مەترسی و پشتبەستن.

*دەگونجێت بەڵگەبیت لەسەر زۆری هەڵبەستنی خەوبینەر.

*بینینی دەریا لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دوایهاتنی تەمەن و پەیوەندیکردن بەجیهانی غەیب و پەنهان لەگەڵ تەمەندرێژی.

*دەریا بەڵگەیە لەسەر سەفەرو جەنگ یان ئەوەی لەدەریا دەردێت لەزیندەوەرو ماڵ و دارایی .

*دەریای شیرینیش باوەڕدارەو سوێریش بێباوەڕە.

*دەگونجێت دەریا بەڵگەبێت لەسەر بارانی ئاسمان.

*دەگونجێت دەریا بەڵگەبێت لەسەر زیکرو یادی خودا چونکە مرۆڤ کاتێ دەریا دەبینێ لەترسا یادو زیکری خودا دەکات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رەوانەوەی خەم و پەژارەو ناسۆری.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر:

+مردن چونکە ماڵ و روح تیادەچێت تێیدا.

+دەستنوێژو پاکبوونەوە لەپیسی یان باوەڕهێنانی بێباوەڕو تەوبەی سەرپێچیکار.

+سوێندخواردن چونکە پەروەردگار سوێند بەدەریا دەخوات ﴿والبحر المسجور﴾(الطور:٦).

+باوك و دایك.

+زیندانیکردن و ژنی بەدڕەوشتی سوزانی.

+ئەوانەی رق و کین هەڵدەگرن.

+زیندان بەهۆی زیندانیکردنی ئاژەڵ تێیدا.

+پیشەسازی و شارێك سنووری نەبێت.

+وازهێنان لەکۆمەڵ و ئامادەبوون لەجەژنەکاندا.

+نەخۆشیەك مرۆڤ لەحەزو ئارەزوو بکات.

*ئەگەر دەریا لەخەودا بەرین و زیادیکردو خەڵکی پێویستیان بەبارانبوو بارانیان بۆ دەبارێت و سوودو قازانجیان بەدەستدەکەوێت.

*ئەگەر دەریای بەپڕو لێوان لێو یان شەپۆلهەڵساوی بینی لەسەفەرەکەیدا ترس و بیم رووی تێدەکات.

*دەگونجێت دەریا بەڵگەبێت لەسەر دنیاو ناڕەحەتی و رووداوە سەر سووڕهێنەرەکانی.

**دەست:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەستی راست هۆکاری پەیداکردنی بژێوییە لەگەڵ ماڵ و سامان و چاکەدا.

*درێژی دەست لەلێکدانەوەدا سەرکەوتنە و بۆ بازرگان سوودە و بۆ بازاڕی ژیری و وریاییە.

*هەروەها دەڵێن: درێژی دەست بۆ ئیمام هێزو توانایەو هێزێکە بۆ یارمەتی و پشتگیریی و زیادبوونی تەمەن و گەورەیی و مەزنی و زیادبوونی ماڵ و سامانە، ئەگەر بینی بوون بەمەڕ تەمەندرێژو خۆشحاڵدەبێ.

*هەروەها وتراوە: تەندروستی هەردوو دەست لەلێکدانەوەدا بەپێی جوانی و باشی وەرگرتن و بەخشینە.

*هەروەها دەڵێن: دەستی راست بەڵگەیە لەسەر خزمە نزیکەکان و هی چەپیش بەڵگەیە لەسەر ژنەکانیان.

*ئەگەر بینی یەکێك لەدەستەکانی لەدەستدا بەڵگەیە لەسەر لەدەستدانی هەندێك لەخزمەکانی بەهۆی سەفەر یان مردنی ئاساییەوە.

*ئەگەر بینی دەستی خستە بنباڵی و دەریهێناو نووری هەبوو زانیاری بەدەستدەهێنێ ئەگەر شایستە بێت یان سوودو قازانج ئەگەر بازرگانبوو، ئەگەر هاتەدەرەوەو ئاگری هەبوو هێزو تواناو سەرکەوتن و شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت، ئەگەر دەریهێناو ئاوی پێوەبوو ماڵ و سامانە.

*دەستی زیادە لەگەڵ هەردوو دەستدا زیادبوونی دەوڵەت و هێزەو بەڵگەیە لەسەر کوڕ یان گەڕانەوەی ئاوارە یان کوڕێکی برازای لەدایکدەبێ.

*ئەگەر بینی قورسە کاروبارەکانی لەسەر قورس وگراندەبێ.

*ئەگەر بینی بەدەستی چەپی کاردەکات لەکۆتاییدا پێداویستی خۆی بەدەستدەهێنێ و فراوانی دەست بەڵگەیە لەسەر دڵفراوانی.

*ئەگەر بینی لەسەر دەست دەڕوات لەکاروبارەکانیدا پشت بەخزمەکانی دەبەستێ.

*ئەگەر بینی بەدەستی دەڕوانێ هەروەك چۆن بەچاوی دەڕوانێ زۆر دەستدەدات لەدەستی ئەوانەی حەرامن لەسەری.

*ئەگەر بینی دەستی راستی گفتوگۆیەکی باشی لەگەڵکرد بژێوی باشدەبێت.

*ئەگەر دەستی چەپی دوا لەگەڵی بەچاکە خزمەکانی سوپاسیدەکەن.

*ئەگەر هەردووکیان لەگەڵی دوان یان سەر زەنشتیانکرد بەڵگەیە لەسەر خراپی کردار.

*ئەگەر دەستی راستی لەژێربوو شەریك یان هاوسەرەکەی دەمرێ.

*ئەگەر بینی دەستیبوە بەدەستی فەرمانڕەواو لەسەر دەستی هەمانکاردەکات لەدادپەروەریو ستەمکاری ئەگەر دووبالی هەبوو دوو کوڕیدەبێ.

*بەلاو نەهامەتیەکانی دەست بەڵگەیە لەسەر قەیرانی برایان، بوونی بەلا لەسەری پەنجەدا منداڵانی براکەیەتی.

*ئەگەر بینی دەستی نییە شتێك داوا دەکات کەپێیناگات.

*ئەگەر تەوقەی لەگەڵ پیاوێکی موسوڵمانداکرد دەستی راکێشا ئەمانەتێکی پێدەسپێرێو نایگەیەنێت.

*ئەگەر بینی دەستی راستی بەردەوام قرتاوە پیاوێکی سوێندخۆرە.

*ئەگەر بینی دەستی راستی بڕاوەو خراوەتە بەردەمی ماڵو سامان لەکاسبی پەیدادەکات.

*کەمو کوڕی لەدەستدا بەڵگەیە لەسەر وازهێنان لەوکارەی کە خەریکە ئەنجامیدەدات.

*ئەگەر بینی لەپی دەستی قرتاوە شتێکە پێیناگات، ئەگەر جومگەکان بڕان ستەمی فەرمانڕەوا رووی تێدەکات.

*ئەگەر تا بازوڵەی شانی بڕا براکەی دەمرێ بەپێی ئایەتی: ﴿ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ ﴾ (القصص: ٣٥)، ئەگەر براینەبوو یاخود کەسێکی نەبوو جێگەی برای بۆ بگرێتەوە لەماڵو سامانی کەمدەبێتەوە.

*ئەگەر بینی دەستەلاتدارێك دەستی ژێردەستەکانی بڕی لەگەڵ قاچیاندا ماڵو سامانیان دەباتو بژێوییان دەشێوێنێ.

*پرسیاریانکرد لە(ئیبن سیرین) دەربارەی بڕینی دەستی لەخەودا،

ئەویش وتی: پیاوێکە کارێك ئەنجام دەداتو پاشان لادەدات لێیو ئەوپیاوەش دارتاشبوو روویکردە کارێکیتر.

* پیاوێکیتر هات بۆلایو وتی: پیاوێکم بینی دەستو قاچی برابوو یەکێکی تریش هەڵواسرابوو، ئەویش وتی: ئەگەر خەونەکەت بەو چەشنەبێت میرەکەت لادەبرێو یەکێکیتر دادەنرێ، لەورۆژەدا (قطن)ی کوڕی (مدرك) لابراو (جراح)ی کوڕی (عەبدوڵلا)دانرا.

* ئەگەر بینی فەرمانڕەوایەك دەستی راستی بڕی سوێندی درۆی لای ئەو فەرمانڕەوایە خواردوە.

* ئەگەر دەستی چەپیان بڕی مردنی برا یا خوشك یاخود بچڕانی تەباییو خۆشەویستی نێوانیانە یان بچڕانی پەیوەندی خزمایەتی یان جیابوونەوەیە لەشەریك یا تەلاقدانی ژنە.

* ئەگەر بینی دەستی لەبەردەرکی فەرمانڕەوا قرتێنرا خاوەنی خۆی نابێت.

* دەستکورتی بەڵگەیە لەسەر لەکیسچوونی ویستو خوازو پەککەوتن لەبەدەستهێنانیداو سەرشۆڕکردنی براو لایەنگرانە.

* لە(ئیبن سیرین)یان پرسی سەبارەت بەپیاوێك لەخەودا ببینێ دەستی راستی لەچەپی درێژتر بێ، ئەویش وتی: ئەو پیاوە چاکە دەکاتو پەیوەندی خزمایەتی دەبەستێ.

* ئەگەر بینی باسکی کورتە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر دزو ناپاكو ستەمکار.

* ئەگەر بینی هەردوو دەستو قۆڵی درێژترە لەوەی لەسەریەتی پیاوێکی دەستو دڵفراوانو ئازایە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی دەستی خستە ژێر بنهەنگڵیو دەریهێناو رووناکبوو ئەگەر قوتابیبوو سەردەستەیی کۆڕی زانیاری بەدەستدەهێنێ، ئەگەر دەستەلاتداربوو پلەوپایەو ناوبانگ بەدەستدەهێنێ لەگەڵ راستگۆیی، ئەگەر بازاڕی یان پیشەوەربوو پلەوپایەو ناوبانگی باش بەدەستدەهێنێ.

* ئەگەر ئاگر لەدەستی هاتە دەرەوە ئەگەر خوێندکاری زانیاریبوو لەزانیارییەکەیدا دەستەلاتو رەوانبێژی بەدەستدەهێنێ، ئەگەر دەستەلاتداربوو دەستەلاتو هێزو سەرکەوتن بەدەستدەهێنێ.

* هەردوو دەست بەڵگەن لەسەر:

+پلەوپایە.

+کوڕو دەستەڵاتداری.
+باشیو چاکی کردارەکان بۆ یەکێك وەریبگرێ یان بیدات.
*دەستی ڕاست بەڵگەیە لەسەر کوڕ یا باوك یاخود هاوڕێو ئەوەی تێکەڵدەبێ لەگەڵی.
*دەستی چەپ بەڵگەیە لەسەر:
+ژن.
+دایكو خوشكو کچ.
*ئەگەر بینی یەکێك لەدەستەکانی لەدەستدا بەڵگەیە لەسەر لەدەستدانی هەندێك لەوانەی دەستەکە بەڵگەبوو لەسەری.
*هەردوو دەست بەڵگەیە لەسەر پیشەسازی کەبەدەستدەکرێ لەگەڵ کتێبو قەڵەم.
*هەروەها دەست بەڵگەیە لەسەر:
+کوڕوبرا.
+ماڵو سامانی هاوسەرەو شەریكو هاوڕێ.
*ئەگەر بینی دەستی قرتاوەو لێی جیابوەتەوە بەڵگەیە لەسەر مردنی براکەی یا هاوڕێکەی یاخود نەمانی پەیوەندیو تەبایی نێوانیان.
*ئەگەر بینی دەستی ڕاستی لەلایەن یەکێك لەبراکانیەوە گیرا پاشان بردی بەرەو چەپ بەڵگەیە لەسەر سووکایەتی ئەوەی گۆڕیویەتی لەهاوڕێو دوژمن.
*ئەگەر درێژی لەدەستیدا بەدیکرد زۆر چاکەی دەبێت بەسەر خەڵکیەوە.
*ئەگەر دەستەڵاتدارێکی بینی هەردوو دەستو قاچی بڕی بەڕاستو چەپ تەوبەدەکات، ئەگەر بینی یەکێك لەدەستەکانی کورتبوونەتەوە بەڵگەیە لەسەر کەمتەرخەمی لەچاکەدا.
*ئەگەر هەردوو دەستو قاچی بینی بڕاون بەبێئەوەی دەستەڵاتدار بیبڕێ خراپەکارییە.
*ئەگەر بینی دەستی نییە عاشقە.
*ئەگەر یەکێك لەفەرمانڕەوایان بینی هەردوو دەستو قاچی بڕاوە لەسەر کاروپیشەکەی لادەبرێ.
*ئەگەر لەگەڵ دەستی خۆیدا چەندین دەستی تری بینی بەڵگەیە لەسەر چاکەکردن لەگەڵی.
*هەروەها وتراوە : بەڵگەیە لەسەر زۆری براکانی یان دەستەڵاتەکەی فراوانو بەهێز دەبێ.
*ئەگەر بینی هەردوو دەستی نوقاندوە بەڵگەیە لەسەر ڕژدیی.

*ئەگەر بینی لەسەر دەستەکانی دەرِوات بەڕێوە بەڵگەیە لەسەر بژێویو رزقو رۆزی.

*ئەگەر بینی دەستەکانی بەچەقۆ بریندار دەکات سەرسامدەبێت بەکارێك بەپێی ئایەتی: ﴿ فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ﴾ (یوسف: ٣١).

*ئەگەر بینی دەستی راستی ئیفلیجبوو بژێوی بۆی دەوەستێ یاخود گوناهێکی گەورە ئەنجامدەدات.

*ئەگەر بینی دەستی بوە بەزێڕ بەڵگەیە لەسەر رۆیشتنی ئەوەی کەلەدەستیدایە.

*ئەگەر بینی دەستی بوە بەدەستی پێغەمبەر خوداوەند کۆمەڵو گروهێك لەسەر دەستی ئەودا رێنومایی دەکاتو خێرو فەرو پیت بلأودەبێتەوە.

*ئەگەر بینی دەستی بوە بەدەستی ستەمکارێك بەڵگەیە لەسەر خراپەو وێڵیو سەرگەردانی کەلەسەر دەستی دەکەوێتەوە یان ستەمێکی گەورەو بێشومار روودەدات.

*ئەگەر بینی دەستی رەنگکردوە لەتەشتێ خوێندا لەفیتنەیەکدا ئامادە دەبێت چونکە لەسەردەمی نەفامیدا ئەگەر خوازیاری جەنگبوبونایە دەستیان لەنێو تەشتە خوێنێکدا نوقمدەکرد.

*ئەگەر لەدەستی خۆیدا دەستی مرۆڤێکی تری بینی لەبژێویو کاسبی خۆیدەخوات.

*ئەگەر بینی دەستی دەخوات یان گازی لێدەگرێ کارێك ئەنجامدەدات پاشگەز دەبێتەوەو لێی یاخود ستەمکار دەبێ بەپێی ئایەتی: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ ﴾ (الفرقان:٢٧).

*دەستی رەنگاو رەنگ بەخەنە ملکەچیو رسوایی یاخود پێویستییە.

*ئەگەر بینی دەستی چەپی قرتابوو سوێندی درۆ دەخوات ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دزی.

*ئەگەر هەردوو دەستو قاچی قرتا دەمرێ، دەگونجێت زیندانی بکرێ یاخود نەخۆشییەکی سەختو توندبگرێ، دەگونجێت هەژارو خاوەن پێداویستیبێت.

*ئەگەر بینی بەدەستی چەپی کاردەکات هەروەك چۆن بەدەستی راستی هەموو کارێکدەکاتماڵو سامان بەدەستدەهێنێو زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکەیدا.

*ئەگەر دەستی درێژبوو بەئەندازەیەك وەك رمی لێهات ستەمكارەو رەخنە لەئابڕوی خەڵكیدەگرێ.

*دەستنوقاندن گرتنو نەبوونی رزقو رۆزییە.

*ئەگەر بینی دەستی براوە بەڵام لێی جیانەبوەتەوە كوڕو برای دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر دەستی لەدەستی مرۆڤێكی تردا بینی بەئەندازەی پێنج سەد دینار پارەی دەستدەكەوێ.

*ئەگەر دەستی بڕا لەخانەوادەكەی دووردەكەوێتەوە یان كاروپیشەكەی دەگۆڕێ یاخود منداڵێكی دەكەوێ یاخود پەیوەندی خزمایەتی دەبچڕێ، دەگونجێت دەست لەگوناهو تاوان بكێشێتەوە.

*ئەگەر كەسێكی غەریب بینی دەستیبڕاوەو خوێنی لێدێت ماڵو سامان بەدەستدەهێنیو دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، ئەگەر خوێنی لێنەهات لەو شوێنە دەمێنێتەوە.

*ئەگەر دەستی درێژبوو بەسەر گەردنیدا واز لەسەرپێچیو تاوان دەهێنێ.

*ئەگەر دەستی خۆڵاویبوو هەژاری ماڵو سامان یان نەبوونی كوڕ یاخود براو زانیاریو خێرە.

*ئەگەر رەگەكانی دەستی بینی تەقین، ئەگەر دەوڵەمەندبوو ماڵو سامانی بەسەردەچێت بەئەندازەی خوێنەكە، ئەگەر هەژاربوو ماڵو سامانی بەو رادەیە دەستدەكەوێ.

*ئەگەر بینی هەردوو دەستی بوە بەمەرمەڕ تەمەنی درێژو خۆشحاڵدەبێت.

*ئەگەر بینی دەستی قورسە كاروبارەكانی قورسو گراندەبێت.

*دەست بەڵگەیە لەسەر:

+پیشە.

+بەڵێندان.

*دەگونجێت لەدەستدانی دەست بەڵگەبێت لەسەر دەوڵەمەندی.

*باشی دەست بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵو باوكو كوڕو باشی ماڵو سامانو بژێوی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مامەڵەی راست لەگەڵ هاوڕێو كرێگرتەكانو چاودێری ئەوانیش بۆ بەرژەوەندییەكانیان.

*دەگونجێت باشی دەست بەڵگەبێت لەسەر زاڵبوونو سەركەوتن بەسەر دوژمناندا.

*ئەگەر لەكاتی بێداریدا دەستو قاچی نەبوو بینی دەستو قاچی بۆ پەیدابوە سوود لەخزمەكەی وەردەگرێ، یاخود

ئەوەی خۆشی دەوێت یان رزق و رۆزی دەدرێت لەلایەکەوە خۆی بۆ ئامادە نەکردوە.

*ئەگەر دەستی تەکاند بەڵگەیە لەسەر لەکاربوونەوەو ئەو کۆت و بەندە لەدەستدا بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی ئاین.

*زیادبوونی دەست بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی و پێویستی بەشتێك خۆی بدات بەسەریا یاخود چاوی کوێردەبێت و پێویستی بەگۆچان دەبێت پێوەی بڕوات.

*ئەگەر هەردوو دەستی لەدەستداو لەگوێڕایەلانبوو پشتبەستنی بەخوداوەند باشدەبێت.

*ئەگەر دەستەکانی زۆربوون بەڵگەیە لەسەر تام وچێژی لەدنیاداو خۆشحاڵی دەربڕینی بەبژێوی.

*ئەگەر دەستی بوو بەدەستی درندە نوێژی دەچێت و شوێنی حەزو ئارەزوو دەکەوێت.

*ئەگەر تووشی نارەحەتیبوو سوودو قازانجە بۆیدێت بەلام دەبێت بەدزو سەردەکەوێت بەسەر دیواردا، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خراپی بنەڕەت هەروەك بەڵگەیە لەسەر خراپی بژێوی.

*ئەگەر بینی دەستی راستی درێژترە چاکەی دەبەخشیّ و پەیوەندی دەکات بەوەوە پەیوەندی لەگەلْ بچڕاندوە.

**دەستبڕین و شتیتر:** (نابلسی) دەڵێت: بڕینی دەست لەخەودا بەڵگەیە لەسەر وازهێنان لەنوێژ یان دەوڵەمەندییە یان تەوبەیە.

*بڕینی دەست و قاچ تێکچوونی ئاینە.

*بڕینی ئامرازی نێرینەی پیاو بەڵگەیە لەسەر نەبوونی وەچە، یان نەمانی پشوو لەلایەن خانەوادەو منداڵەوە.

*بڕینی لووت و گوێچکە بەڵگەیە لەسەر تاوان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەژاری و نەمانی هەواڵ.

*بڕینی زوبان پوچەڵکردنەوەی بەهانەیە.

*ئەگەر بینی ئەندامەکانی براون ئەوە سەفەرێکدەکات و هەندێك لەخانەوادەو کەسەکانی لەوڵاتدا بلاودەبنەوە.

**دەستبلاو:** (نابلسی)دەڵێت: دەستبلاوی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شادی و خۆشی، ئەگەر نەخۆشبوو نەخۆشی لەسەر لادەچێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەوڵەمەندی دوای هەژاری و پلەوپایەداری دوای ملکەچی و رسوایی

یان پیشه لەدوای پیشەو ، پلەوپایە لەدوای پلەوپایە یان ئوتومبیل لەدوای ئوتومبیل ، خۆئەگەر خەوبینەر لەگەشتیارو سەفەرکارانبوو سەفەردەکاتو باش بۆیدێت.

* دەگونجێت هاوسەر یان دەستبلاوی بەڵگەبێت لەسەر سوێندخواردن چونکە خەڵکی سوێند بەتەلاقدەخۆن.

**دەستدان لەبەردە رەشەکە:** (نابلسی) دەڵێت: دەستدان لەبەردە رەشەکە بەڵگەیە لەسەر بەڵێنو پەیماندان بەخەلیفەو پادشا ، یان تەوبەکردن لەسەر دەستی پێشەوایەکی زانادا.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماچکردنی منداڵو هاوسەرو دۆستی خۆشەویست.

* دەگونجێت بەڵگەو نیشانەبێت لەسەر خزمەتکردنی دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوایان یان داوای شەهادەتو نووسینی لەسەریان.

* ئەوەی سێ دەست دەدات لەبەردە رەشەکە دەڵێن: پابەند دەبێت بەپێشەوایەکی خەڵکی (حیجاز)ەوە.

**دەستکەوت:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بۆیەکێك ببینێ بەڵگەیە لەسەر خۆشیو شادیو رزقو رۆزیو بەدەستهێنانی دەستکەوتو فەڕوبەرەکەت لەماڵداو زیادبوون لەوەی بەدەستیهێناوە بەتایبەت ئەگەر پێنجیەکی لێدەرکرد بۆ پەروەردگار.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەستکەوتو ماڵێکی خێردارو زوو تیاچوونی، پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ مَا أَفَاءَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ ﴾ (الحشر:٧).

**دەستگا:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئارامگرتنو جێگیری لەکاروبارو لەجەنگو بشێویدا.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرئەوەی دەشێلرێو بەهۆیەوە مەردوم دەگات بەمەبەستو هیواو ئاواتی.

**دەستگای گۆشتفرۆش:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی دووڕوە لەئاژاوەداو خەڵکی هاندەدات.

**دەستنوێژ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی دەستنوێژ دەگرێو دەچێتە نوێژەوە لەغەمو پەژارە قوتار دەبێتو سوپاسی خوداوەند دەکات لەسەر دەرووی خێر.

* ئەگەر بینی دەستنوێژ دەگرێ بەشتێك کەناگونجێت دەستنوێژی پێبگرێ لەغەمو پەژارەدایەو چاوەڕێی دەرووی خێرەو بەدەستی ناهێنێت.

*ئەگەر بازرگانێك بینی بەبێ دەستنوێژ نوێژدەكات بەبێ سەرمایە بازرگانیدەكات، ئەگەر بەرپرسی سەربازان خەوێكی لەو چەشنەی بینی سەربازانی بۆ كۆنابێتەوە، ئەگەر دان پێدانراوێك خەوێكی لەو چەشنەی بینی لەسەر بڕیارێك جێگیر نابێت.

*ئەگەر بەبێ دەستنوێژ نوێژیكرد لەشوێنێكدا نەدەبوو نوێژ بكات تێدا لەكاروبارەكانیدا سەرسامەو هیچ دەروویەك شك نابات.

*هەروەها دەڵێن: دەستنوێژ لەخەودا ئەمانەتە یاخود قەرزە دەیداتەوە یان گەواهییە دەیدات.

*دەگێڕنەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "پیاوێكم لەنەتەوەی خۆم بینی لەگۆڕەكەیدا سزاو خەشم درابوو بەسەریاو دەستنوێژەكەی دەهاتو لەوحاڵو بارە قوتاریدەكرد".

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی دەستنوێژی گرت بەوەی شیاوە دەستنوێژی پێبگرێ نور لەسەر نورە هەروەك لەهەواڵێكدا هاتوە: "دەستنوێژ بەسەر دەستنوێژدا نورو روناكییە لەسەر نورو رووناكیتر".

*دەگونجێت دەستنوێژ بەڵگەبێت لەسەر بەدەستهێنانی پێداویستی لەلای بڕیارو پۆستداران، ئەگەر هەموو سرووتەكانی دستنوێژەكەی تەواوكرد بەڵگەیە لەسەر گەیشتن بەویستو خوازی، وەگەرنا بەپێچەوانەوە دەبێ. ئەمەش لەكاتێكدا ئەگەر دەستنوێ بگرێت بەوەی شیاوە دەستنوێژی پێ بگرێ، ئەگەر بەشیرو هەنگوینو شتیتر دەستنوێژیگرت ئەوە بەڵگەیە لەسەر قەرز.

*دەستنوێژ لەهەموو ئاینەكاندا باشەو دڵنیاییە لەلای خوداوە.

*ئەگەر دەستنوێژی گرت بۆ نوێژ دەچێتە ژێر پارێزگاری پەروەردگارەوەو ناترسێ لەدوژمنیو خوداوەند بە(موسی) ـ سەلامی خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: "ئەگەر ترسایت دەستنوێژبگرەو فەرمانی نوێژكردن بەسەر خانەوادەكەتدا بدە" ئەوەی دەستنوێژ بگرێ لەدڵنیایدا دەبێ لەوەی لێی ترساوەو خۆی لێپاراستوە.

*ئەگەر لەبەر ئاوی جۆراوجۆردا خۆیشت یان دەستنوێژیگرت ئەوەی لێی دزراوە دەستیدەكەوێتەوە.

*ئەگەر لەجێگەیەكدا دەستنوێژیگرتو نەیتوانی هەڵبسێت و زۆر نەخۆشبوو خەونەكەی بەڵگەیە لەسەر جیابوونەوە لەهاوڕێكەی یان هاوسەرەكەی.

* ئەگەر بینی لەماڵدا دەستنوێژ دەگرێ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەلەو ماڵەدا جێنشین نابێت.

* ئەگەر لەبازاڕی ئاوەداندا دەستنوێژیگرت یاخود لەحەمامدا بەڵگەیە لەسەر خەشمو قینی خوداوەندو فریشتەکانیو ئابڕوچوونو زەرەو دەرکەوتنی ئەوەی شاردوویەتیەوە.

* ئەگەر لەزبڵدانێکدا یان لەدەریایەك خەڵکی دەستنوێژیان لێدەگرت دەستنوێژی هەلگرت بەڵگەیە لەسەر سووکیو رەواندنەوەی غەمو پەژارەو ئێشو ئازار.

* ئەگەر لەسەر سەری هاوڕێیەکی دەستنوێژیگرت کەشتومەكو کاڵای داگیرکردبوو زەرەرێکی گەورە رووی تێدەکاتو دەکەوێتە ئابڕوچوونو غەمێکی گەورەوە.

* ئەگەر بینی دەستنوێژ دەگرێو دەستنوێژەکەی تەواوکرد ، ئەگەر غەمو پەژارەداربوو خوداوەند دەرووی لێدەکاتەوەو ئەگەر ترسابوو دڵنیاد دەکاتو ئەگەر نەخۆشبوو چارەسەریدەکات، ئەگەر قەرزاربوو یارمەتیدەدات قەرزەکەی بداتەوەو ئەگەر گوناهباربوو لێی خۆشدەبێ.

* ئەگەر بینی دەستنوێژەکەی تەواو نەکرد کارێك کەدەست پێدەکات بۆی تەواو ناکرێ.

* ئەگەر بەئاوێکی گەرم دەستنوێژو خۆشۆردنو خواردنەوەی ئەنجامدا غەمو پەژارەو نەخۆشی رووی تێدەکات.

* ئەگەر بەدوای ئاودا دەگەڕا هەتا دەستنوێژ بگرێ بەلأم نەیدەتوانی کاروبارەکانی قورسو گراندەبێ هەتا دەستنوێژدەگرێو تەواویدەکات ئەوکات کاروباری لەسەر ئاساندەبێت.

**دەستەبەر( زامنکردن ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی دەستەبەری شتێکیکرد رەوشێکی فێردەکات.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پابەندبوون بەوەی بەڵگەیەلەسەری، ئەگەر دەستەبەرکراو باشبوو وەك خێر لەیەکێکیتری زامن بکات یاخود پێویستی بۆبەجێبهێنێ یان فریای پێداویستیدارێك بکەوێ بەڵگەیە لەسەر پەلەکردنی لەخێرداو هاوکاریو پشتگیری لێقەوماو، ئەگەر دەستەبەرکراو مەی یا ماڵێکی حەرامبوو بەڵگەیە لەسەر غەرامەو رژدیو نەبوونی.

*دەستەبەرکردن لەخەودا غەرامەیە لەبێداریدا.

**دەستەبەرکردن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: وتراوە: وەك پێوەند راڤەدەکرێ.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر خۆڕاگری لەکاروباردا.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی دەستەبەری مرۆڤێك بکات خراپی لەگەڵ کردوە.

*ئەگەر بینی مرۆڤێك دەستەبەریکرد رزق و رۆزی دەدرێ بەپێی ئایەتی: ﴿وکفلها زکریا﴾ (ال عمران: ٣٧).

*ئەگەر بینی منداڵێکی دەستەبەرکرد ئامۆژگاری دوژمنێك دەکات بەپێی ئایەتی: ﴿ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ ﴾ (القصص:١٢).

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر یەکێك یەکێکی دی دەستەبەریکرد بەڵگەیە لەسەر رزق و رۆزی و سەرکەوتن بەسەر دوژمنانی خودایا.

**دەستەبەرە:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر سەفەرو گواستنەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنێکی رێزداری پلەوپایەدار.

**دەستەرەشمە( جڵەو ):** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر گوێڕایەڵی روو بەخێر یان شەڕ ، ئەگەر جڵەوێکی بەدەستی خۆیەوە بینی کاروبارە قورس و گرانەکانی بەجێدێت.

**دەستەسڕ:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر خزمەتکار یان هاوسەر یا باوك بەتایبەتی ئەگەر چنرابوو ئەوجا بەڵگەیە لەسەر ئەوشتانەی مانای بەرزیان هەڵگرتووەو فەزڵ و چاکەیان زۆرە چونکە لەگەرماو سەرما پشتی پێدەبەستێ یان نوێژی پێوە دەکات.

*دڵنیایی و فەرمانڕەواییە.

*دەستەسڕ خزمەتکارە ئەو رووداوانەشی تێدا دەبینرێ دەخرێتە پاڵ خزمەتکار.

*ئەگەربینی گرێدەدات لەدەسڕێك لەدەسڕەکانی بۆیاخکاران ژنێکی زیناکار دەهێنێ یاخود چاکەکاری ئەنجامدەدات.

**دەستەلاتدار( فەرمانڕەوا ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەستەلاتدار لەخەودا خوداوەندە، بینینی بەحاڵی رەزامەندەوە بەڵگەیە لەسەر رەزامەندی خوداوەند، بینینیشی بەرووگرژی بەڵگەیە لەسەر ئەنجامدانی کارێك لەلایەن خەوبینەرەوە خەشم و قینی خودای لەسەرە.

*ئەگەر بینی دەستەلاتی پێسپێراوە مەزنی و رێزو شکۆ بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی بوە بەفەرمانرشەواو شایستەبوو پلەوپایەی بەرز بەدەستدەهێنێت ، ئەگەر شایستە نەبێت سەرشۆڕیو ملکەچیو پەرتەوازەیی کاروبار بەدەستدەهێنێتو بەلاو نەهامەتی رووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی بوە بەپادشا یان دەستەلاتدارێکی گەورە لەدنیادا رۆخی دەریایەك بەدەستدەهێنێت بەلام ئاینەکەی تێکدەچێ.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بەوچەشنەبوو خەونەکەی بەلام شایستەنەبوو بەخێرایی دەمرێت، هەروەها ئەگەر نەخۆشبوو بەلگەیە لەسەر مەرگی.

*ئەگەر بینی پێشەوا بەگوتارێکی جوانو ناسك سەرزەنشتیکرد چاکیو نێوان خۆشیانە.

*ئەگەر بینی بەگوتارێکی داناپی دەنگی دابڕی لەپێشەوا پێداویستی خۆی بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی لەگەڵ پێشەوادا دەڕوات پابەند دەبێت پێوەی.

*ئەگەر لەرۆیشتندا خۆی پێداکێشا راوبۆچوونی جیاوازدەبێت لەگەڵی.

*ئەگەر لەدوایەوە سواربوبوو بەسواری ولاخێکەوە لەحاڵی ژیانیدا یان دوای مەرگی دەبێت بەجێگری.

*ئەگەر بینی نانەدەخوات لەگەڵی رێزو شکۆی بەئەندازەی ئەو خواردنەی دەیخوات دەستگیردەبێت. هەروەها دەڵێن: جەنگو لەیەك ئاشکرابوونی دێتەرێ.

*ئەگەر خۆی بینی لەگەڵ پێشەوا وانوستوەو هیچ بەربەستێك نییە لەنێوانیاندا پاشان پێشەوا هەڵساو خۆیمایەوە بەڵگەیە لەسەرئەوەی پێشەوا رقی لێیەتی.

*ئەگەر هاوەڵایەتی لەنێوانیاندا چەسپاو ماڵو سامانی بۆ پێشەوا دەبێت، چونکە نوستوو وەك مردوو وایەو بوونی مردووبوونی ماڵو سامانە.

*ئەگەر بینی لەپێش ئیماو پێشەواوە نوستوە پارێزراو دەبێت لەوەی کەخۆی تووشی مەترسیکردوە لەپێناویدا، چونکە نووستن هاوسەنگبوونیەتی لەگەڵیو جۆرێکە لەکاری مەترسیدار.

*ئەگەر بینی لەسەر جێگەی پێشەوا نوستوەو جێگەکەش ناسراوبوو لەلایەن خۆیەوە یاخود هەندێك لەوانەی پەیوەندیان هەیە بەپێشەواوە ژنێك

یاخود ماڵێکی دەستگیردەبێتو دەیکات بەمارەیی ئەو ژنە، ئەگەر جێگەکە نەناسراو نادیاربوو پێشەوا دەستەڵاتداری پێدەبەخشێ، ئەگەر ئیمامو پێشەوا دوا لەگەڵی پلەوپایەو بەرزی بەدەستدەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿ فَلَمَّا كَلَّمَهُ قَالَ اِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴾ (یوسف: ٥٤).

*ئەگەر بازرگانبوو سوودو قازانج بەدەستدەهێنێت ، ئەگەر لەئاژاوەو شەڕدابوو سەردەکەوێ، ئەگەر زیندانیکرابوو ئازاد دەکرێ ، ئەوەی لەگەڵ ئیمامو دەستەڵاتداردابێت هاوبەشی دەستەڵاتو فەرمانڕەواییەکەی دەبێت.

*ئەگەر بینی ئیمامو فەرمانڕەوا چوونە نێو ماڵێك یاخود شوێنێك خراپبوو چوونە نێوی یا چوونەنێو گوندێك خەڵکی ئەو شوێنە بەڵاو نەهامەتی گەورە روویان تێدەکات.

*سەرجەم ئەو وابەستانەی لەحاڵوباری پێشەوادا بەدیدەکرێ باشی حاڵوباری ژێر دەستەکانیەتی، ئەندامەکانیشی بەباشی بینین هێزو تواناو دەستەڵاتیەتی.

*ئەو زیادەو کەمییەی بەسکیەوە دەبینرێ وابەستەی ماڵو سامانو کوڕەکەی دەکرێت.

*ئەگەر بینی چوە نێو ماڵی ئیمام کاروباری خانەوادەی دەگرێتەدەستو فراوانی بژێویو ژیان رووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی جووتبوو لەگەڵ هاوسەری ئیمامدا جیاوازی هەیە لەلێکدانەوەیدا، هەندێکدەڵێن: دەبێت بەکەسە تایبەتەکانی، هەندێکی دی دەڵێن: غەیبەتیاندەکات.

*ئەگەر بینی شتێکی پێدا رێزو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر عەباکەی دایە کچێکی دەداتێ یان ژنێك دەهێنێت پەیوەندی بەدەستەڵاتدارانەوە هەیە.

*سازگاری ئاو دادپەروەری دەستەڵاتدارە، گەڕانەوەی ئاو بۆ دواوە لابردنی دەستەڵاتدارە ، گەڕانەوەی ئاو لەئەندازەی خۆی زیاتر بەرزبوونەوەی ئەو دەستەڵاتدارەیە لەئەندازەی خۆی زیاتر، سەرکەوتنی بەسەر بەرزاییەکدا ستەمکردنی دەستەڵاتدارە لەژێر دەستەکانی .

*بردنی خواردن بەئاو بردنی ماڵو سامانیانە لەلایەن دەستەڵاتدارەوە .

بردنی راخەر یان زەوتکردنی ژنەکانیانە.

*هەڵکەندنی ئاوی رووبار بەدەستهێنانی ماڵو سامانە هەروەها بوونی ئاوتێدا هەر بەوچەشنەیە .

*هەروەها بینینی ئاو لەکێڵگەدا رزقو رۆزییەکە رووی تێدەکات بەپێی ئایەتی: ﴿ نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ ﴾ (السجدة: ٢٧).

*ئەگەر بینی کەوتە نێو ئاوێکەوە پاشان هاتەدەرەوە لێی دەکەوێتە غەمو پەژارەوە پاشان قوتار دەبێت لێی.

*ئەگەر بینی بازیدا بەسەر رووبارەکەدا بۆ دەریاکە لەشەرو خراپەی دەستەڵاتدار قوتاردەبێو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا بەدەستدەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ ﴾ (البقرة: ٢٤٩).

*ئەگەر بەکڕنووشەوە رووی لەماڵی ئیمامکرد لێخۆشبوونو پلەوپایە بەدەستدەهێنێت، ئەگەر روویکردە دەرگاکەی زەفەر بەدوژمنەکانی دەبات.

*ئەگەر بینی دەرگای ماڵی فەرمانڕەوا گواستویەتیەوە یەکێك لەبەرپرسانی لەدەستەڵاتەکەی لادەچێت یاخود ژنێکی دی دەهێنێت.

*رۆیشتنی ئیمامو پێشەوا بەبێ شاردنەوەی نهێنی زاڵبوونە بەسەر دوژمندا.

*پیاهەڵدانی ژێر دەستەکانی سەرکەوتنە بۆی.

*بەردەبارانکردنیان لەلایەن ئیمامەوە بیستنی فتنەو گوتەی رەقو زبرە.

*ئیمام لەلایەن خەڵکەوە دوعاو سکاڵایە لەشەوانی تاریکدا بەهۆی ئەوستەمەی کردوویەتی بەرانبەری ، ئەگەر تیرێکی بەرکەوت بەڵاو نەهامەتیەکی بەردەکەوێ.

*کڕنووشی ژێردەستەکانی بۆی گوێڕایەڵیو باش باسکردنیانە بۆی.

*فڕێدانیان بۆ نێو ئاگر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بانگیاندەکات بۆ وێڵیو سەرگەردانیو کارکردنی بەراوتەگیری ژنەکەیو کەوتنە نێو جەنگێکی دووروردرێژەوەو تیاچوونی موڵکو دەستەڵاتی.

*سواربوونی ئیمام بۆ ئەسپەکەی بەچەکەوە زیادبوونی دەستەڵاتەکەیەتی ، سواربوونی هەڵویەکی گوێڕایەڵ بەدەستهێنانی موڵکە لەرۆژهەڵاتو رۆژئاوا ، پاشان

بەسەرچوونی موڵکەکەی بەپێی چیرۆکی (نەمروود).

*ئەگەر بینی زۆرانبازیدەکات لەگەڵ شێرێکی گەورەو زاڵبوو بەسەریا زاڵدەبێت بەسەر پادشایەکی مەزنو گەورەدا.

*ئەگەر دەستەلاتدارێك بینی دەجەنگێ لەگەڵ دەستەلاتدارێکی تردا دۆڕاویان سەردەکەوێت بەسەر زاڵو سەرکەوتوودا لەکاتی بێداریدا.

*ئەگەر بینی خۆی وازی لەفەرمانڕەوایی هێنا، بەبێئەوەی لەکار بخرێ لەکارێك پەشیمانە بەپێی چیرۆکی (یونس) ـ سەلامی خوای لێبێت ـ کاتێ بەتووڕەییەوە سەریخۆی هەلگرت، ئەگەر کەسێکی دی لایبرد ملکەچیو رسواییە.

*ئەگەر فەرمانڕەوایەك بینی دەڕوات بەڕێوەو هەندێك لەخەڵکی پێشوازییان لێکردو چرپەی خۆشی گەیی بەگوێی لەناکاوو کتوپڕدا دەمرێت بەپێی ئەوەی دەگێڕنەوە کە(شداد)ی کوری (عاد) کاتێ روویکردە ئەو باخچەیەی بۆ خۆی دروستیکردبوو فریشتەی روحکێشان رووی تێکردو لەشێوەی خەڵکی گشتیدا بەدەرکەوتو چرپەیەکیکرد بەگوێچکەیداو روحی کێشا.

*ئەگەر فەرمانڕەوا دوو شاخی بەدیکرد دەبێت بەخاوەنی رۆژهەلاتو رۆژئاوا بەپێی چیرۆکی (ئەسکەندەر).

*ئەگەر شێوەی خۆی وەك خەڵکی بازاڕی بەدیکرد یاخود بینی بەنێو بازاڕدا دەڕواتو خۆی بەگەورە نازانێ ئەوە هیچ زیانێك بەدەستەلاتەکەی ناگات بەڵکو بەهێزتر دەبێ.

*نەخۆشکەوتنی فەرمانڕەوا بەڵگەیە لەسەر زوڵمو ستەمیو جەستەی ساغدەبێت لەو ساڵەداو مەرگیشی ناتەواوییە کەزوو لەناوچەکەی دەکات.

*هەڵگرتنی جەستەی پێشەوا یان فەرمانڕەوا بەسەر شانی یارانەوە هێزو توانای دەستەلاتەکەیو لاوازی ئاینیەتی لەگەڵ لاوازی ئاینی ژێردەستەکانی بەبێئەوەی خوازیاری چاکسازی بێت لێی، ئەگەر ئەسپەردە نەکرا چاکبوونی دەگونجێت بێتەدی.

*لێکدانەوەی ژیانی مردوو هێزو توانای جێنشینایەتی ، بەرزبوونەوەی کۆڕی دەستەلاتدار بەرزبوونەوەی دەستەلاتو ناوبانگ دەرکردنیەتی. تیاچوونی کۆڕو کۆبوونەوەی خراپبوونی کاروباریەتی.

*ئەگەر فەرمانڕەوا بینی هەندێك لەخزمەتکارەکانی نانی دەرخواردداً

بەبێئەوەی سفرەیەك ببینێ هیچکەس بەربەرەکانی دەستەڵاتو مولّکی ناکاتو تەمەندرێژدەبێو ژینی خۆشنوودی پێدەسپێردرێ ئەگەر خواردنەکە چەوری تیابوو.

* ئەگەر مرۆڤێك بینی فەرمانڕەوا بەکارگێڕو بەرپرس دایناوە لەشوێنێکی دوور ئەوە شکۆمەندیو ڕێزە، باسکردنو ناوبانگی بەئەندازەی دووری ئەو شوێنەیە لەفەرمانڕەواوە.

* ئەگەر کاربەدەستێك بینی سەردەمو دەستەڵات بۆی هاتونەتە پێش لابردنییەتی لەوکاتەدا، هەروەها ئەگەر تەماشای ئاوێنەیکرد لابردنییەتی.

* هەروەها ئەگەر بینی ژنەکەی تەڵاقداو لێی جیابوەوە لادەبرێت.

* بردنی مەڕی خەڵکی بەزۆر ستەمی ڕێزدارانی خەڵکییە.

* ئەگەر پادشایەك بینی سفرەیەك ئامادە دەکات نەتەوەیەکی یاخی کێشمەکێشی لەگەڵدەکەن، ئەویش ڕاوێژیان پێدەکاتو دواتر زاڵدەبێ بەسەریاندا.

* ئەگەر بینی خواردن لەسەر سفرەکە دادەنێ نوێنەرێك ڕووی تێدەکاتو کێشمەکێشی لەگەڵدەکات.

* ئەگەر خواردنەکە خۆشو بەتامبوو خۆشیو شادییە.

* ئەگەر چەوربوو لەکێشمەکێشدا مانەوەیە.

* ئەگەر خواردنە خۆشەکەی لابردو خواردنێکی مزری چەوری دانا خێرێکە غەمو پەژارەو جێگیربوونی تێدایە، ئەگەر چەورنەبوو جێگری تێدا نییە، ئەگەر لابردنی خواردنەکە زۆری خایاند لەگەڵ دانانیدا ناکۆکییەکە درێژەدەخایەنێت.

* ئەگەر فەرمانڕەوایەك بینی لەدەستەڵاتی خۆی وازیهێناو لایدا کارێك ئەنجامدەدات پاشگەزدەبێتەوە لێی وەك پاشگەزبوونەوەی (ذي النون) کاتێ بەتوورەیی سەری خۆیهەلگرت.

* ئەگەر بینی بەبێ دەستنوێژ نوێژ دەکات لەشوێنێکدا کەنوێژی تێدا قبولّ نییە وەك گۆڕستانو زبڵدان داواکارو خوازیاری ماڵو سامانێکە بەدەستی دەهێنێت یان دەستەڵاتدای بەدەستدەهێنێت بەبێئەوەی سەربازی لەگەڵدابێت.

* ئەوەی خواردن ببات بۆ بەرپرسو دەستەڵاتدارەکان تووشی غەمو پەژارە دەبێت پاشان دەرووی لێدەکرێتەوەو

مالّو سامانێك بەدەستدەهێنێت لەلایەكەوە چاوەڕێی نەبوە.

*ئەگەر بینی بازدەدات بەسەر هەندێك لەدەستەلأتداراندا شكۆمەندی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی چوە لای دەوڵەمەندیو خۆشحالّی رووی تێدەكات.

*جلوبەرگی رەش بۆ دەستەلأتدار هێزی زیادییە.

*جلوبەرگی سپی زیادبوونی پرشنگو شكۆو دەرچوونە لەگوناهو تاوان.

*جلوبەرگی لۆكە دەركەوتنی دنیانەویستیو خۆبەكەمزانینو كەمی دوژمنو بەدەستهێنانی ئەمنو ئاسایشە بەدرێژایی ژیانی.

*جلوبەرگی خوری زۆری بەرەكەتە لەشوێنی دەستەلأتیداو دەركەوتنی دادپەروەرییە لەمامەڵەدا.

*جلوبەرگی ئاوریشم دەركەوتنی رەفتاروكاری فیرعەونەكانەو باسو خواسی خراپوناڵەبارە.

*لەسەركردنی كلأو یاخود پۆشینی عەبا لەلایەن دەستەلأتدارەوە هیوایە لەدەستەلأتداو، پۆشینو لەبەركردنیشی هەستانیەتی بەپیادەكردنی سیاسەتی.

*لەپێكردنی سۆلی نوێ بردنەوەی مالّو دارایی هاوەڵپەیداكارانو خەڵكی ئەستۆی موسوڵمانانە، فڕینیشی بەهەردووباڵ هێزە بۆی، جنێودانی بەگەلو كۆمەڵێك بەدەستهێنانی مالّو سامانە لەلایەكەوە خۆی بۆ ئامادەنەكردوەو ئازادكردنی ولأتی ئەوانەو زاڵبوونە بەسەر دوژمناندا بەپێی ئایەتی: ﴿ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ، وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَارَهُمْ ﴾ (الأحزاب: ٢٦ـ ٢٧).

*ئەگەر بینی ئیمام یان دەستەلأتدارو فەرمانڕەوا دوای شوێنەواری پێغەمبەر (ﷺ) دەكەوێت شوێنی سوننەتەكانی دەكەوێت.

*ئەگەر بینی لابراو لەجێگەی پیاوێكی لاو دانرا خراپەو زیانی لەلایەن هەندێك لەدوژمنانیەوە پێدەگات.

*لابردنی دەستەلأتدار لەخەودا دەستەلأت پێسپاردنیەتی لەحالّی بێداریدا.

*سەرباز لەخەودا فریشتەی سۆزو بەزەییە ، بەرپرسی سوپا پیاوێكی خاوەن راوتەگبیرە.

*ئەگەر بینی وەزارەتێكی پێ سپێرا كاروباری مەملەكەت بەجێدەهێنێ.

* بینینی دەرگاوانی بەرپرس و میر هەوڵدان و ڕۆچوونیانە لەسیاسەتدا. دەرگاوانی میرو بەرپرس مژدەیە.
* ئەگەر بینی سەرکردەیەك لەنێو سوپایەکدایە خێرو چاکەی دەستگیردەبێت.
* پۆلیس فریشتەی روحکێشە، هەروەها وتراوە: بەڵاو نەهامەتی و غەم و پەژارەیە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی بوە بەسەرۆکی کۆمەڵێك یاخود سەرکردەی ماڵێك یان چاودێرێك بەڵگەیە لەسەر غەم و پەژارە روو لەبژێویدەکات و زیانی توشدەبێ بەتایبەت لەنەخۆش و کاهین و سەرجەم سەرکردایەتیەکان.
* ئەگەر ژنێك بینی ئەو پلەوپایانەی بینی کەبۆ ژن ناگونجێت بەڵگەیە لەسەر مردنی.
* ئەگەر بینی بوە بەدەستەڵاتدارێکی گەورە لەبەرچاوی خەڵکیدا دەگات بەویست و خوازی خۆی.
* ئەگەر دەستەڵاتدارێك بینی کورسیەکەی بەرزترە لەئاستی خۆی پلەوپایەی بەرزو شکۆمەند دەبێت، ئەگەر بینی جێگەکەی نزمتر دەبێ لەوەی خۆی دەستەڵاتەکەی لەناودەچێت و کاروباری دەشێوێ.
* ئەگەر بینی دەستەڵاتدارێکی دادپەوەرو چوە گەڕەکەکەیان یان چوە شوێنێك سووزو بەزەیی خوایی دادەبەزێ بەسەر ئەو شوێنەداو دادپەروەری باڵدەکێشێ بەسەریا.
* ئەگەر فەرمانڕەوایەکی ڕێزداربینی چوە نێو ماڵ و شوێنێك و رقی لێبوو بچێتە ئەو شوێنە لەکاتی بێداریدا بەڵاو نەهامەتی دادەبەزێ بەسەر خەڵکی ئەو شوێنەدا بەئەندازەی ئەو دەستەڵاتە، ئەگەر رقی لێنەبوو بچێتە ئەو شوێنە چوونە نێوی هیچ زیانێك ناگەیەنێت بەخەڵکی ئەو ناوچەیە.
* ئەگەر دژایەتی پادشایەکیکرد دڵشادی و خۆشحاڵی بەدەستدەهێنێت یان لەسەر دەستی ئەودا خێرێکی زۆر بەدی دێت.
* بینینی فەرمانڕەوای مردوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی بەجێیانهێشتوە یان ڕێو رەسمیان بۆ کێشاوە لەدوای خۆیان، بینینی زیندوەکانیان لەوڵات شوێنێکی دیاریکراو بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی حاڵ و باریان لەگەڵ ملکەچی رەوش و هەڵسوکەوت.

*هەروەها بینینی پادشاو فەرمانڕەوا بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتن بەسەر خراپەکاریدا.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر شێر هەروەك چۆن بینینی میر بەڵگەیە لەسەر گورگو بینینی بازرگانیش لەسەر ڕێوی‌و دەلاکیش لەسەر سەگو باوەڕدار لەسەر مەڕ.

*هەروەها بینینی دەستەڵاتداری نادیار بەڵگەیە لەسەر ئاگرو دەریاو نوستنێك مرۆڤ پەستو خەشمداربكات، ئەگەر دەستەڵاتداری بینی بەڵگەیە لەسەر زاڵبوونی بەسەر کەسانی خوارتردا ، یان زاڵبوون بەسەریا بەهۆی بڕیارێکی فەرمانڕەواوە.

*ئەوەی پادشاو فەرمانڕەوا لەبارو شێوەیەکی باشدا بەدیبکات بەڵگەیە لەسەر حاڵباشی ژێردەستەکانی‌و هەستکردن بەئاسایش‌و بەڕێوەچوونی بژێویان، ئەگەر لەحاڵوبارێکی خراپدا بەدیکرد بەڵگەیە لەسەر خراپی باورحاڵی ژێردەستەکانی‌و زاڵبوونی دوژمنان بەسەر ولاتەکەیدا.

*لاوازی سەربازانی فەرمانڕەواو پادشای نادیار یاخود دادوەری پەروەرشیار دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر پەروەردگار.

*دەگونجێت بینینی پادشاو فەرمانڕەوا بەڵگەبێت لەسەر درهەمی سکە لێدراو یان دیناری سکەلێدراوە، ئەگەر پادشاو فەرمانڕەوا هاوچشنی ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسالی ئازادکردن‌و ڕۆژی حونەیندا بەدەستیهێنا پشتگیری دەکرێ‌و سەرکەوتوو دەبێت.

*ئەگەر بینی بوە بەپادشاو میرو فەرمانڕەوا دەگونجێت پلەوپایەی بەرزببێتەوە ئەگەر شایستەبێت ، ئەگەر هەژاربێت دەوڵەمەند دەبێت ، ئەگەر زانابێت بەوچەشنە دەبێت کەوا پێویستە ، ئەگەر ڕەبەنبێت هاوسەردەگرێ، ئەگەر پیشەوەربێت خەلکی ئامازەی پێدەکەن بەهۆی شارەزاییەوە.

*ئەگەر بینی ماچیدەستەڵاتدار دەکات یان تەوقەی لەگەڵدەکات‌و قسەو گفتوگۆ هەبوو لەنێویاندا حاڵوباری چاکدەبێ .

*ئەگەر دژایەتی دەستەڵاتداریکرد بەقورئان مشتومڕو بەربەرەکانیدەکات چونکە دەستەڵاتدار لەزوبانی عەرەبیدا بەمانای بەڵگەهاتوە.

*ئەگەر بینی لای دەستەڵاتدار خواردنێك دەخوات لەلایەن ئەوەوە غەم‌و پەژارەی پێدەگات بەئەندازەی خواردنەکەی.

*ئەگەر بینی دەستەڵاتدار هات بۆ ماڵەکەی پێویستی بەپشتگیری ئەو هەیەو دڵنیادەبێت لێیو دەبێت بەکەسە تایبەتەکانی.
*ئەگەر بینی دەستەڵاتدار بەهۆی گومانێکەوە دەستگیریکردو یەکێکی راسپارد بۆ دەستگیرکردنی پێداویستیەکانی بەجێدێت.
*ئەگەر کەسێکی نەخۆش ببینێ دەستەڵاتدارێکی نادیار بانگیکرد یاخود فەرمانڕەوایەك پیاووڵایەنگرانی خۆی نارد دەستگیربیکەن نوێنەرەکانی فریشتەی مەرگنو خوداوەند دەستەڵاتدارەو خۆشی دادوەریدەکات لەنێوان بەندەکانیدا.
*ئەگەر بینی دەستەڵاتدار کڵاوەکەی برد ماڵو سامانەکەی دەبات، ئەگەر کارگەربوو دەریدەکات.
*ئەگەر دەستەڵاتدارێکی لەسەرەمەرگدا بینی بەڵاو نەهامەتی رووی تێکردوە نزیکە لەسەر کار لابرێ.
*ئەگەر دەستەڵاتداری بەشێتی بینی غەمو پەژارە دادەبارێ بەسەریا.
*ئەگەر دەستەڵاتداری بینی لەکۆڕو کۆبوونەوەی خۆی لایدا یاخود لابرا یان زاڵبوو بەسەریا یان هەندێك لەدەستەڵاتی لێسەندرایەوە لەناوچوونی دەستەڵاتەکەیەتی.
*ئەگەر بینی دەستەڵاتدارێك لەماڵی خۆیی هاتە دەرەوە بۆ هەتا هەتایی دەرچوونیەتی لەپۆستی دەستەڵاتی بەهەر حاڵێك بێت.
*ئەگەر دوانگەی ئیمامێکی بینی شکابوو یاخود کەوتبوو خەریکی نوێژ بۆکردنی خەڵکیبوو بەڵام بۆی تەواونەکردن یان سەری تاشیو جلوبەرگەکەی لێداماڵی یان شمشێری خستە سەرگەردنی یان ماڵەکەی رووخا یاخود گایەك شۆقی لێدا یان ئاژەڵێك شێلای سەرجەم ئەو حاڵانە دوورخستنەوەیەتی لەپۆستی دەستەڵاتو هیچ خێرێکی تێدا نییە.
*ئەگەر بینی سەری دەستەڵاتدار مەزنەو گەردنی رەقە یاخود ورگو سکی گەورەیە یان هەر زیادەیەك هێزو وزەو توانایە لەدەستەڵاتدایە لەگەڵ سەرۆکایەتی لەماڵو موڵکیدا ، ئەگەر ناتەواوی لەهەریەکێکیاندا بەدیکرد کەمو کورییە لەدەستەڵاتیدایەو لاوازییە لەهێزو توانایدا.
*هەروەها ئەگەر جاسوسێك بینی بوە بەدەستەڵاتدار ئەو حاڵەی شادرویەتیەوە بەدەردەکەوێت ، ژنیش

ئەگەر بینی بوە بەدەستەلاتدار ئابڕوویدەچێت ، ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێت.

* ئەگەر بینی دەستەلاتدارێکی دادپەروەر دەژیو لەولاتێکدایە دادپەوەری بالدەکێشێ بەسەر ئەو شارو ولاتەدا ، هەروەها ئەگەر دەستەلاتدارێکی ستەمکاری بینی لەشوێنێکدا دەژی ستەم لەو شوێنو جێگەیەدا بلاودەبێتەوە.

* ئەگەر بینی دەستەلاتدارێك دەچێتە نێو گوندێك ستەمو خراپە لەو شوێنەدا بلاودەبێتەوە.

* ئەگەر لەدەستیدا هێزو درێژی بەدیکرد پشتگیرەکانی خاوەن هێزو توانان، ئەگەر مەزنی لێبەدیکرد زیادبوونی مالو داراییە، ئەگەر قاچەکانی بینی درێژترە بەئەندازەی خۆی زیاتربوو تەمەندرێژییەو زۆر دەمێنێتەوە.

* ئەگەر قاچەکانی بوون بەمەڕمەڕ تەمەندرێژو خۆشنوود دەبێت.

**دەسکەوان:** (ئیبن سیرین)دەلێت: پیاوێکە کاردەکاتو ئەرکو ماندوبوون دەکێشێ لەچاککردنی کاروبارێکدا کەسانیتر ناتوانن چاکیبکەن.

(نابلسی)دەلێت: دەسکەوان بەلگەیە لەسەر شەڕو ئاژاوەو توندوتیژی لەداواکردندا.

* دەگونجێت بینینی بەلگەبێت لەسەر بەدەستهێنانی پێداویستیو ئاسانکردنی کاروبارەکان.

(نابلسی)دەلێت: پیاوو ژنێکە کەسیان دەستەبەری ئەوی دیکە نابێتو کارو فرمانی قورسوگران ئەنجامدەدەنو کەسیتر کاری لەو چەشنەی پێناکرێ.

* بۆ پیاو بەلگەیە لەسەر شکۆمەندیو بەرزی.

* بەلگەیە لەسەر:

+خوێنەر.

+کچ.

+گۆرانیبێژ.

+مندالێك زۆر قسەبکاتو بدوێت.

**دەسکی شمشێرو چەقۆ:**

(نابلسی)دەلێت: بەلگەیە لەسەر ئەوەی زەکات پێویست دەبێت لەسەری لەحوشترو مانگاو مەڕو ئالتونو زیو.

**دەعوەتی مندالبوون (زیافەت):**

(نابلسی)دەلێت: ئەوەی ئامادەی نانخواردنبوو یاخود خۆی ئەو دەعوەتەیکرد بەلگەیە لەسەر ڕەواندنەوەی غەمو پەژارەو پلەوپایە کەخەلکی لەدەوری کۆدەبنەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو ئازاردان بەدەستو زوبان.

**دەف:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لێدانی دەف غەمو پەژارەیە لەگەڵ بەلاو نەهامەتیو ناوبانگ بۆیەکێك لەگەڵیدابێت ، ئەگەر دەفەکە بەدەستی کچێکەوەبوو خێرێکی دیارو ناسراوە بەپێی ناواخن، ئەگەر ژنی لەگەڵدابوو فەرمانو راوێژو سوننەتێکی بەناوبانگە لەسەرجەم ساڵاندا، ئەگەر لەگەڵ پیاوێکدابوو ناوبانگە.

(نابلسی) دەڵێت: ئامێرەکانی مۆسیقا هەمووی لەشاییو ئاهەنگدا بەلاو نەهامەتییە بۆ خەڵکی ئەوماڵە. دەفیش دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گەڕانەوەی کەسێکی ئاوارەو موسافیر.

**دەفتەر:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رێکخستنی بژێوی خەوبینەرو بیرکردنەوە لەشتە دێرینەکان.

*دەفتەر بۆ پادشا بەڵگەیە لەسەر گەنجینەو هەرێمەکان.

*بینینی بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجو رزقو رۆزی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو لێدانو هەڵسپاردن.

**دەفری شیرو هەنگوین:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی زانایە یان خاوەن ماڵو سامانێکی بێشومارە.

*ئەگەر دەفرەکە گلێنەبوو شیری تیابوو رزقو رۆزییە.

*ئەگەر زێڕبوو ماڵو سامانێکە کەمدەکاتو زەرەرێ تێدەکەوێت چونکە شیر خراپدەکات .

*ئەگەر شیری لەمەنجەڵی خۆیدا بینی بەڵگەی خێرە.

*ئەگەر لەدەفرێکی ئاڵتوونیدا بینی بەڵگەی زەرەرە.

**دەفری شیرینی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەفری شیرینی بەڵگەیە لەسەر کیژی جوانو قەشەنگ.

**دەفژەن** : (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خۆشیو شادی، ئەگەر چووە لای نەخۆش دەمرێتو دەلاوێنێتەوە بەسەریاو دەف دەژەنن لەپرسەکەیدا، دەگونجێت لەشساغ بێتەوەو خەڵکی لەسەر خوانو میوانداری ئەو کۆببنەوە.

**دەلاڵ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەلاڵ باش نییە لەخەودا.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی دەلاڵ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خێر یا شەڕ یان توانا، پەیماندان بەناوبانگییە

لەکاتی بێداریداو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرئەوەی مارە دەبڕێت یاخود دەویتو دەلالێکی نادیارە ئەگەر چوە لای نەخۆشێك بەڵگەیە لەسەر مەرگی.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: دەلالْ پیاوێکی جامبازە بانگەشەی دەستفراوانیو دڵنیابوون دەکات.

**دەڵەشێر:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ژنێکی شەڕەنگێزی بەسۆزە بۆ کوڕەکەی.

* هەروەها دەڵەشێر کچی پادشاو فەرمانڕەوایە.

* ئەگەر بینی لەگەڵ دەڵەشێرێك جووتدەبێ لەنارەحەتییەکی قورسوگران قوتاردەبێو ناوبانگدەردەکاتو بەسەر دوژمنەکانیدا زاڵدەبێ، ئەگەر لەجەنگدابوو زۆرشوێن دەگرێ.

* ئەگەر شیری دەڵەشێری خوارد ماڵوسامان لەلایەن دەستەلاتدارەوە بەدەستدەهێنێو زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا.

* ئەگەر دەڵەشێری خوارد دەستەلاتو موڵکێکی گەورە بەدەستدەهێنێ.

**دەمار:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵێکە نەخۆشی پێوەیە.

* هەروەها دەڵێت: دەمار گەورەی نەتەوەی خۆیەتی لەنێو خزمەکاندا.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا رێکخەری کاروباری مرۆڤە، ئەگەر نەخۆشبوو تەمەنی بەسەر دەچێت.

* دەمار نهێنی توانای مرۆڤەو بەڵگەیە لەسەر خواناسیو پەیمانو بەڵێنو هۆکاری رزقو رۆزی.

* دەمار خانەوادەیەو ئەو ناتەواوییەی دێت بەسەریا رووڵەیەکێك لەئەندامانی خانەوادەکەیدەکات.

**دەمارەبیستن:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی ئەو دەمارەی لەگوێچکەی دەرهێنا یان لەگوێچکەی مرۆڤێکی دەرهێنا ژار بەدەستیەوە دەبێتو پارێزراودەبێ لەخراپەی ستەمکاران، ئەگەر گوێچکەی پاککردەوە لەپیسی یان شتی خراپ بەڵگەیە لەسەر هەواڵی باشو چاك لەلایەکەوە رووی تێدەکات.

* هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی لەچڵكو پیسی گوێچکەی دەخوات نێربازیدەکات لەگەڵ هەرزەکاراندا.

**دەمامك:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا رازیبوونەبەدەستی دەهێنێ.

**دەمبووس( دەرزی سەرخڕ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەمبووس برایەکی هاوڕایە یاخود کوڕ یا خزمەتکارەو

بەرگری لەهاوەڵەکەیدەکات و بەزەیی پێدادێتەوە.

(نابلسی) دەڵێت: دەمبووس لەخەودا بەدبەختی و هەژارییە ، ئەگەر ئاسنبوو داری لەگەڵنەبوو خزمەتێکی کەمە یاخود ژنێکی بێجیهازە.

**دەمخواربوون:**(نابلسی)دەڵێت: تێکچوونی ئاینە، ئەوەی تووشی دەمخواری ببێ خواناسی بەدەستدەهێنێ یان دەچێتە نێو بیدعەیەك و دەگونجێت سزایەك رووی تێبکات.

**دەمگر:**(نابلسی) دەڵێت: دەمگر لەخەودا سەرۆکی ماڵ و بژێوی پەیداکاری ماڵە لادەبرێ، ئەگەر لەچاو ونبوو سەرکردەیاندەمرێت.

**دەنکەهەنار:**(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا رزق و رۆزییەکی ئاسانە بەبێ ماندوبوون بەدەستیدەهێنێت.

**دەنکی رەش:**(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەشساغی رووی تێدەکات.

**دەنکی سەوز:**(ئیبن سیرین)دەڵێت: سوودو قازانجە لەلایەن پیاوێکی سەیرو سەرنج راکێشەوە پێیدەگات.

(نابلسی)دەڵێت: دەنکی سەوز لەخەودا سوودو قازانجە لەلایەن پیاوێکی غەریبی توندەوە پێیدەگات، هەروەها دەنکی سەوز قەزوانە.

**دەنگ:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: حیلەی ئەسپ بەدەستهێنانی شکۆمەندییە لەپیاوێکی رێزدارو قسەو گوفتاری بەوچەشنەیە گەر بدوێت چونکە ئاژەڵ درۆ ناکات.

*زەڕەی گوێدرێژ سووکایەتی و توندوتیژییە لەلایەن پیاوێکی گێل و کەودەنەوە.

*رژدی و بەخیلی قورسییە لەپیاوێکی رەق و زبرەوە دیاریدەدات.

*بۆڕەی گا رووداني فیتنەو ئاشووبە.

*دەنگی حوشتر سەفەرێکی مەزنە وەك (حەج)و تێکۆشان و بازرگانییەکی بەسوودە.

*<u>باعەباعی مەڕ</u>: چاکەیە لەلایەن پیاوێکی چاکەوە ئەنجامدەدرێ.

*<u>دەنگی بەران</u>: خۆشحاڵی و فەڕوپیتە.

*<u>نەڕەی شێر</u>: ترسانە لەدەستەڵاتدارێکی ستەمکارە.

*<u>میاواندنی پشیلە</u>: نامەردییە لەخزمەتکارێکی دزو جەردە.

*<u>دەنگی ئاسك</u>: هێنانی کچێکی جوان و شۆخ و شەنگە.

*دەنگی ڕێوی: پلانو فێڵە لەپیاوێکی درۆزن.

*وەڕین و حەپەی سەگ: پەشیمانییە لەستەمکارێك.

*مرەی بەراز: زاڵبوونو سەرکەوتنە بەسەر دوژمنی نەزانو بەدەستهێنانی ماڵو دارایییە.

*دەنگی مشك: زیانە لەپیاوێکی دەمامك بەستی درزو خراپن.

*دەنگی چەقەڵ: هاواری ژنانو ئاگرپەرستە هەژارەکانە.

*نەڕەی پڵنگ: قسەی پیاوێکی تەماعکارە.

*دەنگی حوشترمورغ: پێکانی خزمەتکارێکی ئازایە.

*گمەگمی کۆتر: ژنێکی قورئانخوێنی موسوڵمانو داوێنپاکە.

*دەنگی پەڕەسێلکە: ئامۆژگاری مۆچیاریدەرە.

*هەروەها دەڵێن: وتەی باڵندە هەمووی باشەو بەڵگەی بەرزی خەوبینەرە.

*فیشکەی مار: بەڵێنی دوژمنێکی بێدەنگە بەتۆڵەسەندن، پاشان زاڵدەبێت بەسەریا.

*دەنگی بۆق: خۆکردنەبەکاری هەندێك لەسەرۆکەکان یان زانایان.

*پیاوێك هات بۆ لای (ئیبن سیرین)و وتی: لەخەودا بینیم ئاژەڵێك دوا لەگەڵم، ئەویش وتی: دەمرێت پاشان ئایەتی: ﴿ وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ ﴾ النمل: ٨٢). ئنجا لەو ڕۆژەدا ئەوپیاوە مرد.

*زیرەزیری زەردەواڵە: بەڵێنو وادەیە لەپیاوێکی جنێوفرۆشی هیچو پووچو ناتوانرێت لێی قوتاربببیت مەگەر پەنابە پیاوێکی خراپەو بەد بگری.

*خڕەی پارەی وردە: قسەو وتەی باشە لەشوێنێکەوە دەیبیستیٚ حەزدەکات زیاتر ببیستیٚ، ئەگەر پارەی قەڵبوو بەربەرەکانی دوژمنە.

*بەرزکردنەوەی دەنگ زاڵبوونە بەسەر گەلو نەتەوەیەکدا بەخراپە بەبەڵگەی : ﴿ وَاغْضُضْ مِنْ صَوْتِكَ ﴾ (لقمان:١٩).

*ئەگەر دەنگێکی خۆشی باشی بیست دەستەلاّت بەدەستدەهێنیٚ.

*ئەگەر بینی مرۆڤێك قسەی پێگوت خراپەی لێدەبینیٚ پاشان زاڵدەبێت بەسەریاو سەردەکەوێت.

*ئەگەر قسەبێژ دەستەلاّتداربوو قسەپێوتراو حاڵی باشتردەبیٚ لەقسەبێژ.

*ئەگەر بینی بەتەنیا خۆی هاوار دەکات هێزو توانای لاواز دەبێت، ئەگەر دەنگی بەسەر دەنگی زانایەکدا بەرزکردەوە گوناهو تاوانێک ئەنجامدەدات بەپێی ئایەتی: ﴿ لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ ﴾ (الحجرات: ٢).زانایانیش جێنشینی پێغەمبەرانن.

(نابلسی) دەڵێن: ئەگەر دەنگی مرۆڤی لەئاژەڵەوە بیست بەڵگەیە لەسەر سوودێکی مەزنو گەورە بەتایبەت ئەگەر لەبارەی شتێکەوە دوا لەگەڵی پێیخۆشبوو.

*ئەگەر دەنگی بەرزکردەوە بەسەر دەنگی زانایەکدا گوناهێک ئەنجامدەدات.

*دەنگی کزو لاواز ترس‌وبیمەو نزمکردنەوەی دەنگیش قەرزو خۆبەکەمزانینە.

*دەستەلاتدارو پۆلیس ئەگەر دەنگیان شاردرایەوە کزو لاوازبوو لادەبرێت لەکارەکەیانو ملکەچو رسوا دەبن.

*خڕەی پارەی وردە: فتنەو ئاشووبە بۆ دەستەلاتدارانو بیستنی بەدەستهێنانی بەلێنو نزیکبوونەوەی پشووە.

*بیستنی دەنگی دینار: هەواڵی دڵخۆشکەرەو بەڵگەیە لەسەر قسەی باش.

*بیستنی خڕەی پارەیەك نەخش‌و نیگاری لەسەر نەبێت بەڵگەیە لەسەر وتەیەکی پارێزکاری.

*بیستنی خڕەی پارەی چاك‌و دینار بیستنی گوتەیەکە پێیخۆشەو حەزدەکات زیاتر بیبیستێ ئەگەر بەهۆی هاوەلایەتیەوە بێت.

*ویزەویزی زەردەواڵە: بەلێنو پەیمانە لەپیاوێکی جنێوفرۆشی سووکەوە ناتوانێ لێی قوتار ببێت هەتا پەنا نەگرێ بەپیاوێکی بەدو خراپ.

*باعە باعی مەڕ: نەرمیو ناسکییە یاخود چاکەیە لەپیاوێکی بەخشندەو دەست‌و دڵفراوانە.

*دەنگی بەران: خۆشیو فەرپیت‌و خێرە.

*حیلەی ئەسپ: بەدەستهێنانی دیارییەکە لەپیاوێکی رێزدار یان سەربازێکی ئازاوە.

*دەنگی ئاژەڵ: غەم‌و پەژارەو ترس‌و بیمەو حیلەی ئەسپ مەزنیو شکۆو هێزە.

*حەپەی سەگ: قسەو خۆهەڵقورتانە لەشتێکدا پەیوەندی پێوەنییە.

*نەڕەی پڵنگ: خۆنواندنو سپڵەییە.

*گمەگمی کۆتر: شیوەن یا شاییە.

*دەنگــی پەڕەســێلکە: قــسەیەکی بەســوود یــان گوێگرتنــە لــەقورئانی پیرۆز.

*دەنگــی بـۆق: خۆشــیو شــاییە یــان دەنگی پاسەوانو چاودێرە.

*فیشکەی مار: جەنگاندنو ئاگادارییە.

*زەڕەی گوێدرێــــژ: دوعاکردنـــــە لەستەمکاران.

*دەنگـــــی هێـــــستر: قـــــسەو وتەیەلەکاروباری گوماناویدا.

*دەنگی حوشتر: هیلاکیو ماندوبوونە.

*نـــەڕەی شـــێر: ســـەرگەردانیو هەڕەشەیە.

*میاوەمیـاوی پـشیلە: دەنگـەدەنگو فیتنەییو چاوداگرتنو فێڵە.

*دەنگـــــی مـــشك: کۆبوونــــەوەی خۆشەویستو رزقو رۆزییە.

*دەنگی ئاسك: بیرکردنی نیشتمانە.

*لورەی گـورگ: ئاگادارییـە بـەڕوودانی دزی.

*دەنگی رێوی: ئاگادارییـە بەهـەڵهاتنو گواستنەوە.

*دەنگـی چـەقەڵ: کاروبـاری گرنگـە لەخێروچاکەدا.

*دەنگـی مـشك: زیانــە لــەپیاوێکی دەماغبەستی خراپ یان دزینی شتێکە.

*لـورەی گـورگ: ترسـانە لـەپیاوێکی دزی فێڵباز.

*راڤـەکارانی خـەو دەنگی باڵنـدەکانی دەریایـــان بـــەباش نـــەزانیوە وەك تاوسو...وتویانە : غەمو پەژارەیە.

*دەنگـی قەلــەڕەش: جیابوونــەوەو لاواندنەوەو شیوەنە.

*بیستنی هەموو دەنگێکی ناقۆڵا غەمو پــەژارەو خراپەیــەو دەنگــی باشــیش خۆشیو شادییە.

**دەنگدەرەوە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیـــاوێکی رووپاماییکـــارە بـــەرۆژ ملکەچـــیو خواناســـی دەنـــوێنێو بەشـــەویش خراپـــەدەکات وەك دزیو ئازاردانی خەڵکی.

*هــەروەها دەڵــێن: پیــاوێکی رێگــرو جەردەیەو بەنهێنی کاری خۆیدەکاتو پــارەو مــاڵو ســامان کۆدەکاتــەوەو لەگەڵ کەسدا تێکەڵ نابێت.

**دەنگــە دەنــگ( قاووقیــژ ):** (ئــیبن سیرین)دەڵێت: بیستنی دەنگەدەنگو قاوقیــژ لەخــەودا بەڵگەیــە لەســەر سەرپێــچیو وەرنــەگرتنی ئامۆژگــاری بــەپێی ئایــەتی: ﴿واذا سمعوا اللغو اعرضوا عنه﴾ (القصص:٥٥).

*دەنگـــــەدەنگ لەســــوێندخواردندا بەڵگەیە لەسەر تەوبە بۆ سەرپێچیکارو موســـوڵمانبوونی بێبـــاوەڕە بـــەپێی ئایــەتی:﴿لا يُؤاخِذكُمُ اللهُ باللغوِ فِي أيمانِكم﴾ (البقرة:٢٢٥).

**دەنووك:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: دەنووك بەڵگەیە لەسەر باسکردنی خاوەنەکەیو مانـدوبوونی لەگـەڵ ئـەو خزمـەتکارەی هــیچ خزمەتگوزارییــەك ئــەنجام نــادات بەلیدان نەبێت.

*هەروەها بەڵگەیە لەسـەر گوێدرێژەکـەی کەبەلیدان دەڕوات بەڕێوە.

پلەوپایەدار دەبێتو دەستەڵات بەسەر ڕۆیشتنی بەئەندازەی توانا شکاندنییەتی بەسەر دیوارەکەدا.
* ئەوەی تەماشی دیوارێك بکاتو وێنەی خۆی لەدیوارەکەدا بەدیبکات دەمرێتو لەسەر گۆڕەکەی ناوی دەنووسرێ.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر دیوارێکی بەرزکردەوەو پاشان رووخاندی پیاوێك لەبژێویدەخات یاخود دەیکوژێ ئەگەر دیوارەکەی زانی هی کوێیە هاوەڵەکەی لەغەمو پەژارەدا دەمرێت.
* هەروەها دەڵێن: دیوار پیاوێکی خاوەن شکۆو دەستەڵاتدارە زاڵەو بەنەرمو نیانی کاروبارەکانی بەڕێوەدەبات.
* دیواری شار پیاوانی تێکۆشەرە یاخود دەستەڵاتداری بەهێزە یان سەرۆکێکی پارێزەرە بۆئەوەی خاوەنداریتی دەگەڕێتەوە سەری، ئەگەر لەسەر دیوارەکەوە بازیدا یان خۆی چەماندەوە بەسەر گۆچانێکدا لەپیاوێکی باوەڕدارەوە دەگۆڕێت بۆ پاوێکی دووڕوو، یان دەستبەرداری راوێژکردن لەگەڵ باوەڕدارێك دەبێت بۆ دووڕوویەك.
* ئەگەر لەدیوارێکەوە کەوتەخوارەوە حاڵو باری تێکدەچێو ئومێد بڕاو دەبێت، یان دەستبەرداری کاروبارێك دەبێت کەلەمێژە دەستی پێوە گرتوە.
* ئەگەربینی وەك ئەوەی لەسەر دیوارێك دانیشتوەو بازنێکی ئاڵتوونی لەدەستکردوە، شکۆمەندیو پلەوپایەو ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت.

* بینینی دیوار لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:
+زانیاریو ڕێنومایی.
+کەوتن بەسەر نهێنیەکدا.
+جیاوازی خستنە نێو هاوەڵان.
* ئەگەربینی دیوارەکە دەکەوێتە نێو ماڵەکە خاوەنەکەی نەخۆشدەکەوێت ، ئەگەر دیوارەکە کەوتە دەرەوەی ماڵەکە خاوەنەکەی دەمرێت ، ئەگەر موسافیربوو دەگەڕێتەوە.
* ئەگەربینی دیوارێك لەشوێنو جێی خۆی نوێدەبێتەوە خزمایەتیو ژنو ژنخوازییە.
* ئەگەر دیوارێك لەخشت دوستبکات کردارو رەفتارێکی چاکە ئەنجامدەدات، دروستکردنی بیناو ساختمانیش بەخشتی سوورو گەچ باش نییە، هەروەها دیواریش ئەگەر لەوشوێنەدا شەق بەرێت دروستبوونی زیندانێکە لەوجێگەیەدا، هەروەها داری قلیشبردوو بەهەمان شێوەیە.
* هاتنەدەرەوەی ئاو لەدیوار غەمو پەژارەیە لەلایەن براو زاواوە.
(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر سەرەتای دوژمن، ئەگەر پەرژین بەڵگەبێت لەسەر ماڵ پەنجەرەو ئەملاولاکەی پاسەوانو چاودێرانی ئەون.
**دیوەخان** : (ئیبن سیرین) دەڵێت: دیوان شوێنی بەلاو نەهامەتییە داخستنی پێوەدانی دەروازەکانی بەلاو نەهامەتییەو کردنەوەو ئاوەلاشی خستنەسەر پشتی دەروازەکانی شەڕو خراپەیە.



# ڕێ

## ڕا

**ڕابەری:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ملکەچی‌و خۆڕاگرتنە، ئەگەر مرۆڤێك ڕابەریکرد داوای کوشتنی مرۆڤێك یان برینداركردنی لێدەكرێ.

*ئەگەر شێرێك یا باڵندەیەكی دڕندە ڕابەرایەتیكرد ملكەچییە تووشی دەبێت لەدەستەڵاتدارەوەو بەڵاو نەهامەتییەكە دێت بەسەریا لەنەخۆشی‌و ...

**ڕاچڵەکین:** (نابلسی)دەڵێت: ڕاچڵەكین لەخەودا بەڵگەیە لەسەر چوست‌و چالاكی‌و خێرایی جموجوڵ لەكاتی سەفەرداو گواستنەوە لەشوێنێكەوە بۆ شوێنێكیتر یاخود لەبۆچوون‌و مەزهەبی ئاینێكەوە بۆیەكێكیتر.

**ڕاخەر( مافوور):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ڕاخەرو مافور دنیایە بۆ خاوەنەكەی ، ڕاخستنی دنیایەو فراوانیشی ئاوەڵابوونی ڕزق‌و ڕۆزییە ، لایەكانیشی درێژی تەمەنە.

*ئەگەر بینینی لەشوێن‌و جێگەیەكی نادیار ڕایخست یان لای كۆمەڵێك كەنەیدەناسین سەفەر دێتە ڕێی، بچووكی ڕاخەریش كەمی حەیاو تەمەنە، پێچانەوەی نەمانی نیعمەت‌و تەمەنە.

*ئەوەی خۆی ببینێ لەسەر ڕاخەرێك بەسەلامەتی دەردەچێت ئەگەر لەجەنگدابوو ، ئەگەر لەجەنگدا نەبوو كێڵگەیەك دەكڕێت. ڕاخستنی ڕاخەرو مافور لەنێوان گەل‌و نەتەوەیەكی ناسراو یان لەشوێن‌و جێگەی شاراوەدا بەڵگەیە لەسەر هاوبەشبوونی خەڵكی ئەو ناوچەیە لەو نیعمەتەدا.

*هەروەها دەڵێن: ڕاخستنی مافور پیاهەڵدانە بەخاوەنەكەیدا كەمافوری بۆ ڕادەخرێ، ئەو زەوییەشی بەسەریدا دەڕوات‌و شوێنەوارێتی هەموو ئەوانە بەئەندازەی فراوانی ڕاخەرەكەو جوانی‌و قەشەنگییەتی، ئەگەر بینی ڕاخەرێكی

نوێی بۆ ڕاخرا لەدنیادا رزق و ڕۆزی فراواندەبێت و تەمەنی درێژ دەبێت.

* ئەگەر ڕاخەرەکە لەماڵی خۆی یان شارو ناوچەو نێوان نەتەوەکەیدابوو یان لای ئەوانەی دەیناسین بەشێك لەدنیا بەدەستدەهێنێت بەپێی ئەو پیاهەڵدانە.

* ئەگەر لەشوێن و جێگەیەکی نادیاربوو غەریب و ئاوارە دەکەوێت.

* ئەگەر ڕاخەرو مافورەکە بچووك و توندو تۆڵبوو شکۆمەندی لەوپلەوپایە بەدەستدەهێنێت لەدنیاداو کەمدەستیش دەبێت.

* ئەگەر ناسکبوو بەئەندازەی ڕاخەرەکەو فراوانبوونی دنیاو رزق و ڕۆزی بەدەستدەهێنێت، ئەگەر بینی ڕاخەرەکە بچووك و کۆنە هیچ خێرێکی تێدا نییە.

* ئەگەر ڕاخەرەکەی بەپێچراوەیی بینی لەسەر گەردنی و لەشوێن و جێگەیەکەوە دەیگواستەوە بۆ شوێن و جێگەیەکیتر ئەگەر گواستیەوە بۆ شوێن و جێگەیەکی نادیار تەمەنی بەسەر دەچێت و دنیای دەپێچرێتەوەو شوێنەوارەکانی دەخرێتە ئەستۆی.

* ئەگەر لەشوێنی یەکێك لەمردواندا بینی بەجێدێت، ئەگەر ڕاخەرێکی پێچراوەی بینی نەیپێچرابووەو ئاگای لەپێچانەوەی نەبوو بەڕاخراویش نەی بینیبوو ئەوا دنیای دەپێچرێتەوەو کەم تێدا دەمێنێتەوەو تەنگی بژێوی ڕووی تێدەکات.

* ئەگەر مافوری بۆ ڕاخرا رزق دەدرێت و دەرووی لێدەکرێتەوە.

* ڕاخەر بەڵگەیە لەسەر دانیشتن لەگەڵ داناو سەرۆك و پلەداران، هەر یەکێکیش پێبخاتە سەر ڕاخەرەکەی.

* ئەوەی ڕاخەرەکەی بپێچرێتەوە سەفەرەکەی بەجێنایەت یان دنیای دوایی دێت.

* ئەگەر ڕاخەرەکەی لێبرا یان سووتا بەئاگر هاوەڵەکەی دەمرێت و سەفەرەکەی بەجێنایەت. ئەگەر چارەنووسی تەنگ و ئەستەمبوو دنیای لێدێتەوە یەك، ئەگەر ڕاخەرەکەی ناسکبوو چارەنووسی نزیکدەبێتەوە یاخود لەش و لاری لەڕو لاواز دەبێت یان مەرگی بۆ پێشدێت.

(نابلسی) دەڵێت: ڕاخەر لەخەودا فراوانی پلەوپایەو شکۆیە، بەتایبەت ئەگەر بوو بەخاوەنی و لەسەری دانیشت لەزستاندا.

* ڕاخەرو سەرجەم چەشنەکانی ئامرازی بەرپرسی ماڵە.

*ئەگەر بینی وەك ئەوەی تەماشای ڕاخەرێکی ڕاخراو بکات و لەتەختی ڕاخراوەکەدا پەیکەری پیاوێکی تیابێت و بدوێت و پیاوەکەبناسێ ئەو پیاوە لەسەر ناحەق و بەتاڵەو خەوبین بەقسەی ئەوپیاوە سەرسامدەبێت.

**ڕارەوی ڕزق وڕۆزی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر شوێنی ڕزق و ڕۆزی و هۆکاری وەك فرۆشگاو پیشەو سەفەرو هاوچەشنی ئەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+کێم و زوخم.

+ئاودێری.

+ڕاڕەوی سەفەر.

+دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژینی خەڵکی ئەگەر بۆ خەڵکی گشتی بێت.

*ئەگەر جۆگەلەی ئاوەکەی بینی ئاوێکی سازگاری لەبەر دەڕوات لەدەرەوەی شار بۆ ناوەوەی و خەڵکی ستایشی خوداوەندەکەن لەسەری و ئاو دەخۆنەوە دەفرەکانیان پڕ دەکەن لەوکاتەدا تەماشای حاڵیاندەکرێ، ئەگەر لەژێر دەردو نەخۆشیدابن پەروردگار ژینی خۆشنوودییان پێدەبەخشێ بەهۆی باران یاخود ڕشتنی خواردن بەسەریاندا.

*ئەگەر هیچکام لەوانە نەبوو خەڵکی ڕوودەکات کاڵاکانیان و بازاڕیان گەرمدەبێت ، ئەگەر ئاوەکە لیڵبوو یاسوێر یاخود لەجۆگەلەکە دەرچوو زیانی بەخەڵکی گەیاند خراپەیەك ڕوو لەو خەڵکەدەکات و یاخود نەخۆشیەکی گشتی وەك هەلامەت و لەرزوتایان خراپەوو زیانێك دێتە ڕێی گەشتیاران یان دەستکەوت و ماڵ و دارایی پیس و گەندەڵ ڕوویان تێدەکات بەئەندازەی خەونەکە.

*بەلام ئەگەر بینی ئاوی لەبەردەڕوات بۆ نێو ماڵ یاخود فرۆشگەکەی بەڵگەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کەسە تایبەتەکانی بەئەندازەی ڕوونی ئاوەکەو سازگاریی و ڕێکی ڕۆیشتنی.

*ئەگەر بینی ئاوەکە دەڕوات بۆ نێو باخەکەی تەماشای حاڵ وباریدەکرێ ئەگەر ڕەبەنبوو هاوسەردەگرێ و جووتدەبێت لەگەڵی.

*ئەگەر ڕۆیشتنی ئاوەکە خراپبوو بەپێچەوانەوەی جۆگەوەیە، ئەگەر ئاوەکەی خوێنبوو، خانەوادەکەی شوودەکات بەکەسێکیتر لەکاتێکدا هێشتا لەئەستۆی ئەودایە یا لەکاتی جیابوونەیاندا بەپێی حاڵ وبارەکەی.

*هەندێکـدەڵێن: ئـەو جۆگەلەیـەی پیاوێـك دەیگـرێو نـوقم نابێـت تێـدا ژیـانێکی خۆشـە بـۆ یـەکێك ببێـت بـەخاوەنی بەتایبـەت ئەگـەر ئاوەکـە لەسەرچـاوەکەی کـەمیکرد، ئەگـەر بەلێشاو لەبـەری ڕۆیـی بـەلای ڕاسـتو چەپدا غەمو پەژارەو گریانە بۆ خـەڵکی ئـەو ناوچـەیە ، هـەروەها ئەگـەر جۆگەلەکەش بەنێو ماڵەکەیاندا تێپەڕی ژیانێکی شادو خۆشگوزەرانە.

*دەگێڕنـەوە پیاوێـك جۆگەلەیـەك دەبینێ پـڕ لـەخۆڵو پیسییەو ئـەویش خاکەنازەکـەی هەڵـدەگرێو پاکیدەکاتەوەو بەئاوێکی زۆر دەیشوات هەتا ئاوەکە بـەخێرایی پێدا بـڕوات بـۆ بەیانی نارەحەتـدەبێو دواتـر ئاسـاییو سروشتی دەبێتەوە.

(نابلـسی) دەڵێـت: ئـەوەی ببێـت بـەخاوەنی ئـاوێکی لەبـەر ڕۆیـشتبوو پلەوپایـەو سـوودو قـازانجی دەسـتگیر دەبێت.

*ئەگـەر جۆگەلەیـەکی پـڕ لـەخۆڵو پیـسی دیو شـتی نەخۆشـدەکەویو پاشان چاکدەبێتەوە.

*ئەگەر ئـاوی بینـی لەقاچـەکانی دێتـە دەرەوە نەخۆشییەکی تووشدەبێت.

*جۆگەلـەی خـوێن لەماڵـدا بەڵگەیـە لەسەر خراپی ژن لەو ماڵەدا.

*ئەگەر جۆگەلەیەکی بینـی لەرەوگـەی خـۆی چـوەدەرەوەو زیـانی هـەبوو بـۆ خەڵکی هەواڵێکی خراپ ڕووی تێدەکات یان بڵاودەبێتەوە لەنێویاندا.

*دەگونجێت جۆگەلە ژن بێت.

*ئەگـەر بینـی جۆگەلـەی بـڕی نێـوانی خۆیو ژنەکەی دەبچڕێ یان پەیوەنـدی لەگەڵ کەسە نزیکەکانی.

*ئەگـەر خـۆی بینـی لەپـشتی جۆگەلەیەکـەوە دەمرێـتو ژنەکـەی لەدوای خۆی بەجێدەهێڵێ.

*ئەگـەر بینـی ئـاو لەجۆگەلەیـەك هەڵـدەگۆزێ خێـری دەسـتگیردەبێتو ژینێکی خۆش بەسەردەبات.

*ئەگەر جۆگەلەیەکی بینـی ڕوودەکاتـە بێـستانەکەی یاکێڵگەکـەیو ئاوەکـەی خوێنـە هاوسـەرەکەی کەسـێکیتر دەیهێنێتو مارەیدەبڕێ.

*ئەگـەر بینـی ئـاوێکی سـازگار دەخواتـەوە لەجۆگەلەیـەك یـان لـەڕووبارێك ژینێکـی خـۆش بەسـەردەباتو تەمـەنی درێـژ دەبـێ، ئەگەر ئاوەکەی لێڵبوو یا تاڵبوو ژینـی پڕ لەغەمو پەژارەو ترسو بیم دەبێت.

* هەروەها دەڵێن: نەخۆشییە بەئەندازەی خواردنی لەئاوەکە.
* ئاودێریش منداڵێکە لەژێر فەرمان و ڕێگریدایە.
* دەگونجێت ئاودێری بەڵگەبێت لەسەر ڕەگەکانی لەش و لارو ئەوی بەئاودێری دەژێتەوە.

**رازیبوون:** (نابلسی)دەڵێت: رازیبوون لەسەر ئەوشتانەی خوداوەند پێی خۆشە بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی پیاوچاکان و دوورکەوتنەوە لەکەسانی خراپ.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر بینینی:

+گەنجیەوانی موڵک و پەیامبەری مژدەبەرو خێر.

+بەجێهێنانی بەڵێن و پەیمان.

+بەدەستهێنانی پێداویستی.

+وەلامدانەوەی نزاو دوعا.

* ئەگەر بەرپرسەکەی لێی تورەبوو ڕەزامەندی لێوە دەستگیر دەبێت بەتایبەت ئەگەر بەرووبوومێکی بەهەشتی پێدا یان پۆشاکێکی دایە یا رووی تێکرد هەموو ئەوانەو هاوچەشنەکانی بەڵگەیە لەسەر ڕەزامەندی خوداوەندو دەرخستنی نازو نیعمەت بەنهێنی و ئاشکرا.

* هەروەها بینینی ڕەزامەندی بەڵگەیەلەسەر نازو نیعمەت و بژێوی و ڕەزامەندی خوداوەند.
* ئەگەر بینی لەبەهەشتدایەو فریشتەکان سڵاوی لێدەکەن و لەهەموو دەروازەیەکەوە رووی تێدەکەن خوداوەند لێیخۆشدەبێ و چاوپۆشی لێدەکات و بەئارامگرتنی تەواوی دەگات بەخێروچاکە.
* ئەگەر بینی ڕەزامەندی خوداوەند داباریوە بەسەریا بەڵگەیە لەسەر ڕەواندنەوەی غەم و پەژارەو سینەسافی و بژێوی و ژینی خۆشنوود.

**راستگۆ:** (نابلسی) دەڵێت: ئەو فریشتەیەیە کاروباری خەوی پێسپێراوەو هێنانی نموونە لە(لوح المحفوظ - تەختی پارێزراو) بینینی بەڵگەیە لەسەر مژدەو بەجێهێنانی بەڵێن و مەرگ و ژیان و سەفەرو گەڕانەوەو هاوسەرو منداڵ و دەستەلات و شکۆمەندی و سەرکەوتن و ملکەچی.

* ئەگەر خەوبینەر شتێکی پێدرا بەڵگەبوو لەسەر شتێکیتر یان پێی راگەیەندرا هەیە چونکە فریشتەی راستگۆ راسپێردراوە بەوکارەو هاوچەشنەکانی.

*بینینی بەڵگەیە لەسەر وەرگێڕ لەسەر زوبانی پادشاو ئاگاداری نهێنیەکانیان.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر جوامێری‌و پزیشکی‌و زانیاری دەرخستن‌و کەسێك کەراهاتوە لەسەر ئاگاداریی لە(لوح المحفوظ) وەك پەروەرشیار یان پەرتووك.
**راستگۆیی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بیاوەرێك بینی راستگۆبوە باوەڕدەهێنێ هەروەها ئەگەر باوەرێدارێکی بینی باوەڕیهێنا راستگۆدەبێت.
(نابلسی) دەڵێت: راستگۆیی لەخەودا قوتاربوونە لەخراپەو بەلاو نەهامەتی‌و هەندێکیان دەڵێن: راستگۆیی باشە.
**راڤەکاری خەو:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: راڤەکار بەڵگەیە لەسەر دادوەرو زاناو پزیشك‌و هەموو شتێك مرۆڤ غەمبارو خۆشحاڵبکات.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مزگەوت‌و قورئانخوێن چونکە مژدەدەر ئاگادارە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر :
+کێشکار.
+ئەوەی کێشانە چارەسەردەکات.
+نهێنی ئاشکراکاری فەرمانڕەوا.
+جل‌وبەرگشۆر.
+مووبڕ.
+ئەوەی غەم‌و پەژارە دەڕەوێنێتەوە.
+خوێنەری کتێب‌و گۆڤارو ژیاننامەی میرو پادشایان.
*ئەگەر خەونەکەی بۆ راڤەکارێك گێڕایەوەو هی ئەوبوو هاوتای دانایی‌و واقع دەبێت، ئەگەر لەدەستەواژەکانی حاڵینەبوو دەگونجێت پێویستی بەهەندێك ببێت لەوەی پیشەوەرێك پێویستی پێیەتی.
*هەندێکدەڵێن: راڤەکاری خەو پیاوێکە داخوازی هەڵنوتانی خەڵکە.
(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بۆ غەمبار بەڵگەیە لەسەر خۆشی‌و شادیان‌و بۆ شادیش بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارە. ئەوەی خوازیاری کاروبارێکی نادیاربێت خوازو ویستی خۆی بەدی دەهێنێت‌و ئەگەر چاوەڕێی هەواڵی کەسێکی نادیاربێت هەواڵی پێدەگات.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر زانیاری بەهێماکان‌و کردنەوەی گرفت‌و دەرخستنی نهێنی، هەروەها بەڵگەیە لەسەر هەواڵگێڕەرەوەو زانای کاروباری شەرعی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئامۆژگاریدەر بۆ هاوەڵەکەی‌و ئەوەی دڵی پێدەسووتێ.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کەسێك نهێنی نەشارێتەوە.
**راکێشان:** (نابلسی)دەڵێت: راکێشانی ئەو شتەی دەتوانرێت بەکێش بکرێت بەڵگەیە لەسەر سووكو ئاسانکردنی کاروباری قورس‌وگران‌و رامکردنی بەهیمەتی یان بەباشی مامەڵەکردن لەگەڵیدا.
* ئەگەر شتی راکێشراو بەڵگەبوو لەسەر شەڕو خراپە دەرەنجام‌و چارەنووسی روو بەخراپە دەچێت.
**ران:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ران هۆزو تیرەی پیاوە، ئەگەر بینی رانی قرتاو دەرکەوت ئاوارەدەکەوێ لەکۆمەڵ‌و خانەوادەکەی تامەرگی لەتاراوگە دەبێت.
* ئەگەر بینی رانی مسە کەس‌وخانەوادەی سووردەبن لەسەر سەرپێچی.
* دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: رانم بەسووری بینی‌و مووی لێهاتبوو بەپیاوێکم وت موەکەی بۆ تاشیم. ئەویش وتی: تۆ پیاوێکی قەرزاری‌و خزمێکت قەرزەکەت بۆ دەداتەوە.
* کەموکوڕی لەراندا بەڵگەیە لەسەر کەمی خزم‌و کەس‌وکارو تیرەو هۆزو ئاوارەیی‌و دوورکەوتنەوە لەخزم‌وکەس‌وکارو تەنیایی.
* ئێش‌وئازاری ران بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خاوەنەکەی خراپە بۆ خزمەکانی.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی رانی هەڵتۆقیوە ناتوانێ کارەکانی ئەنجامبدات‌و کاروباری بۆ پێکنایەت.
* ئەگەر پارچە گۆشتێکی بینی نووسابوو بەرانیەوە کوڕێك دەدرێتەپاڵی‌و هی ئەو نییە.
* هەروەها ران بەڵگەیە لەسەر یەکێك لەکۆڵەکەکانی (بیت).
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرئەوەی پشتی پێدەبەسترێ لەگەورەو باوك‌و هاوسەر یان کاسبی یاخود ئاژەڵ یان ئامرازێك یارمەتی بدات لەبژێوی پەیداکردندا.
* هەروەها بەڵگەیە لەسەر خانەوادە و خزم ئەگەر رانی بینی باشبوو بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵ‌وباری هەروەها ئەگەر خراپەیەکی لێ بینی واژووی ئەوەیە.
* بێسوودی‌و پەککەوتنی ران بەڵگەیە لەسەر پووچەڵکردنەوەی سوودی هاوسەر یان ئۆتومبیل‌و هۆکاری گواستنەوە.
* ران بەگەڵگەیە لەسەر:

+نوێژو باشی بەجێهێنانی.
+جلوبەرگ.
+شوێنی دانیشتن.
**ڕانپـەز( پەچـە )**: (نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا گەنجینـەی داراییـە، ئەگـەر ڕانپەرزێکی ماڵی هەژار دەرکەوی ئەگەر لەبەری ڕۆیی‌و قوماشی خراپکرد غەم‌و پەژارەیە.
*ئەگـەر کەوتـە نێـو ڕانپـەزێك‌و لێـی نەهاتە دەرەوە زیندانی دەکرێ.
*ئەگـەر شـیری لەپەچـەیەکدا ڕشـت یـاخود میزیکـردو خوێنبـوو یـا هەنگوینبوو لەدواوە دەچێتە لای ژن.
*ڕانپـەز ژنــە یـاخود خزمتکارێکــە پارێزگاری لەماڵدەکات.
**ڕاو( شکار)**: (نابلسی) دەڵێت: لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر گـەنج‌و دەسـتکەوت، ئەگـەر بینـی ئاسـکێك یاکەروێـشکێك یاگوێدرێـژێکی کێـوی ڕاوکـرد مـاڵ‌و سامان‌و دەستکەوت بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر بینی بەردیگرتە باڵندە یا مانگا بەمەبەسـتیتر ژنێـك یـا کـچێك تاوانباردەکات.
*ئەگـەر بینـی ڕاو بەسـەگ دەکـات بەهیواو ئارەزووی خۆیدەگات.
*ئەگـەر سـەگی ڕاوی بینـی دەچـوە دەرەوە بـۆ ڕاو خێـرە بـۆ سـەرجەم خـەڵکی‌و بەڵگەیـە لەسـەرکردارو جموجووڵی مرۆڤ.
*ئەگەر بینی سەگ لـەڕاو دەگەڕێتـەوە بەڵگەیـە لەسـەر ڕەواندنـەوەی تـرس‌وبیم‌و بێکـاری، ئەگـەر بینـی خۆیـدەکات بەشـاردا بەڵگەیـە لەسـەر بێکاریی.
*ئەگەر بینـی لـەدەریادا ماسـی تـازەو خـۆش بـەئامێر ڕاودەکـات بەڵگەیـە لەسـەرگرتنی هۆکـارێکی حـەڵاڵ‌و هەوڵـدان بـۆ دۆزینـەوەی هـەتا ڕزق‌و ڕۆزی حەڵاڵی پێ پەیدابکرێ.
*ڕاو بۆ پیاو بەڵگەیە لەسەر زاڵکردنـی ڕاوبۆچـوون‌و هـەوڵی خـۆی، ئەگـەر ڕەبەنبوو هاوسەردەگرێ.
*ئەگەر هاوسـەرداربوو کـوڕێکی دەبـێ بەئەنـدازەی ئـەوەی ڕاویکـردوە وەك بەچکە یان گـەورە، وەگـەرنا منداڵەکـە مێینە دەبێت.
*ڕاوی ژن بەڵگەیـە لەسـەر خـوازی خۆپـارێزیی کەلـەناخی بـاوکی یـان مێردەکەیدایە.
*ڕاوی منـداڵ بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی دەیپـارێزێ‌و لەبەریـدەکات لـەزانیاری‌و پیشە یان ئەو میراتیـەی کەلەباوکیـەوە بۆیدەمێنێتەوە.

**راوچی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: راوچی پیاوێکی هەواداری ژنانەو لەداواخوازیاندا فێڵیان لێدەکات، چونکە کارو پیشەکەی لەشێوەی فێڵدایە.

*دەگونجێت راوچی بەڵگەبێت لەسەر بازرگانی کۆیلە یان ئەوانەی بازرگانی بەچارەنووسی مرۆڤەوە دەکەن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گەرماو (حەمام)و مامۆستای حوجرەو سەرجەم ئەوشتانەی خەڵکی بەدەستدەیهێنێت لەپیشەسازیو خشڵدا.

*دەگونجێت راوچی بەڵگەبێت لەسەر دەویتی.

*ئەگەر راوەکەی لەدەریادابوو یاخود لەوشکانیدا بەڵگەی خێرە، بەڵام ئەگەر لەمانگە یاساغکراوەکاندابوو یاخود بەچەشنێبوو لەوشکانیدا گونجاو نەبوو خراپە.

*راوچی درندە دەستەڵاتدارێکی بەهێزەو سەربازان دەشکێنێو توانای دەسەڵاتدارە ستەمکارەکانیش کەمدەکاتەوە.

*راوچی هەڵۆو باز دەستەڵاتدارێکی مەزنە خاوەن پیلانەو دەستەڵاتداران فریودەدات ئەوانەی یاخیو سەرپێچیکارن.

*راوچی باڵندەو چۆلەکە پیاوێکی بازرگانە فرۆفێڵ لەخەڵکی باشدەکات.

*راوچی درندە فێڵ لەعەجەمیەکان دەکاتو دەیانشکێنێ.

*راوچی ماسی لەگەڵ ژنو کچاندا مامەڵەدەکات.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی راوچی بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتنو زاڵبوون بەسەر خەڵکی ئاوارەدا ئەگەر راوچی درندەبێت.

*راوچی باڵندەی ویتەویتکارو خاوەن دەنگ مامۆستای منداڵانە لەگۆرانیو ئامۆژگاریدا.

**راوێژکردن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەر کەسێکی خراپ راوێژ بکات بەکەسێکی پاكو بێگەرد نزیکدەبێتەوە لەوەی تەوبە بکات ، هەموو کەسێکی پاكو بێگەردیش ئەگەر راوێژی بەکەسێکی خراپکرد لەبیدعە نزیکدەبێتەوە، ئەگەر راوێژی بەکەسێکی باشکرد دەیەوێت چاکە ئەنجامبدات، ئەگەر کەسێکی خراپ راوێژی بەخراپێکیتر کرد ژاری دەرخوارد دەدرێ.

**راهێنەری ئەسپ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: راهێنەری ئەسپ خاوەن دەستەڵاتو پلەوپایەیە.

## رژ

**رژدی**:(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کەوتنەکاری یاساغو حەرامەوە .

## رس

**رستن( بادان )**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: پەت لەسەر گۆچان پەیمانو کارێکی خراپو جادوە خوداوەند دەفەرموێ: ﴿فَأَلْقَوْا حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ﴾ (الشعراء: ٤٤).

*ئەگەر پەتێکی بادا یان پێوای یاخود لوولیکرد لەسەر مەکۆیەك سەفەردەکاتو هەموو لوولییەکیش هەر بەو چەشنەیە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەستنی کاروبار لەگەڵ هاوکاریو مارەبڕیندا.

*تەشی ژنو خول خولۆکەی بەڵگەن لەسەر هاوسەرگیری رەبەنو بوونی شەریکایەتیو منداڵبوونی ئافرەتی دووگیان.

*ئەگەر پیاوێك تەشی رێسا سەفەردەکاتو کارێك دەبەستێو بەڵگەیە لەسەر گەوهەری ئەوەی دەیرێسی یان غەزەل دەکات بەشیعر.

*ئەگەر ئەوەی ژنان دەیرێسن رێستی هەمووی ملکەچیو سەرشۆڕییە لەسەفەردا یاخود کارێکدەکات سەری لێدەشێوێ بەلام حەرام نییە.

*تەشی رستنی ژنان بۆ ئەوەی لەسەفەداریە بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی لەسەفەردا یان گەڕانەوەی کەسی ئاوارە.

*(ذي القرنين) دەڵێت: رستن تەمەنی پیاوە، تەشی هاوسەری ژنەو ونکردنی تەلاقدانیەتی.

*دەگێڕنەوە ژنێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: ژنێکم بینی قیری دەڕێسا سەرسامبووم پێی ، ئەویش وتی: بۆچی؟ لەکاتێکدا شێواندنی ئاسانتربوو لەبەستنی، ئنجا وتی: ئەو ژنە حەقداربوو وازی لێهێنا بۆ هاوەڵەکەی، ئنجا پاشگەزبوەوە لەو بڕیارەی ، ژنەکەش خۆی وتی: راستدەکەیت مارەییم لای مێردەکەم هەبوو لەحاڵی ژیانمدا وازم لێهێناو کاتێ مرد لەمیراتیەکەی وەرمگرت ، بەلام ئەگەر ژنێك بینی قیر دەڕێسێ پەلەدەکاتو کەسێکی نادیارو ئاوارەی دەگەڕێتەوە، ئەگەر بینی بەهێواشی دەیرێسێ خۆیو مێردەکەی سەفەردەکات، ئەگەر قولاپی تەشیەکە بچرا خۆڕێکخستن بۆ سەفەر

دوادەکەویٚو خۆرێکخستنی ئاوارەو غەریب پەکی دەکەویٚت لەگەڕانەوەدا.

*ئەگەر بینی هەور دەڕێسیٚ هەوڵدەدات بۆ چوونە نێو کۆڕی داناییەوە.

*ئەگەر بینی خوری دەڕێسیٚ ناپاکی لەگەڵ پیاوی هاوسەریدەکات.

*ئەگەر پیاوێك خوری ڕێسبێت یان کەتان خۆی دەچوێنیٚ بەژنانو ملکەچیو ڕسوایی بەدەستدەهێنیٚ بەڵام کارو پیشەی حەڵاڵ ئەنجامدەدات ئەگەر لەبری خوری دانەوێڵەی ڕێسا ئەستوربوو سەفەرێکە بەماندبوونو هیلاکی بەدیدێت.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ژنێك لەخەودا بینی خوری دەڕێسیٚ ئاوارەیەکی دەگەڕێتەوە، ئەگەر هێواشو لەسەرخۆبوو سەفەردەکات یان مێردەکەی سەفەردەکات، ئەگەر قولاپی تەشیەکە بچڕا سەفەرەکەی هەڵدەوەشێتەوە.

*ئەگەر لۆکەی ڕێسا مارەییەکەی بەجێدەهێڵیٚ بۆ مێردەکەی ، پاشان دەگەڕێتەوە بۆی.

*ئەگەر کەتانی ڕێسا هەوڵدەدات بچێت بۆ کۆڕی دانایی.

*ئەگەر پیاوێك بینی لۆکە یان کەتان دەڕێسیٚ ئەو پیاوە خۆی دەچوێنیٚ بەژنانو ملکەچیو ڕسوایی دێت بەسەرداو کارێك ئەنجامدەدات شارەزاو لێهاتوو نابێت تێدا.

*ئەگەر ڕێسراوەکە ئەستوربوو کارێك بەئەستەمو ماندوبوونێکی زۆر ئەنجام دەدات.

*ئەگەر هەر ئەستوربوو سەفەرێکدەکات سەرکەوتنی تیا بەجێدەهێنیٚ.

*ئەگەر ژنێك لۆکەی ڕێسا ناپاکیو خیانەت لەمێردەکەی دەکات.

*ئەگەر خوری یان مووی ڕێسا سەفەردەکاتو خێری دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر بینی ئەو ڕێسراوەی بچڕی پەیمانو بەڵێن ئەنجامدەدات.

**ڕسوایی ( ملکەچی ):** (نابلسی)دەڵێت: بینینو دیاریدانی لەزاناو تێکۆشەران بەڵگەیە لەسەر سستی لەئاینو تواناو توندوتیژی بێباوەڕان.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر مەرگی نەخۆشو زیندانیو هەژارییو کوێری.

*دەگونجێت ئەو خەونە بەڵگەبێت لەسەر:
+مژدە.
+پشوودان بەدوژمن کەشادە بەغەمو پەژارەی.

**ڕ ش**

**ڕشانەوە( تاعون ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر جەنگ، هەروەها جەنگیش بەڵگەیە لەسەر ڕشانەوە.
*ئەگەر بینی بورایەوە هیچ خێرێکی تێدانییەو باش نییە لەلێکدانەوەدا.
*ڕشانەوە غەمو پەژارەیە، ئەگەر بینی تووشی ڕشانەوەبوو غەمو پەژارە ڕووی تێدەکات.
*ئەگەر بینی ئەندامەکانی بڕاون سەفەردەکاتو خانەوادەو کەس‌وکارەکەی پەرتەوازە دەبن بەپێی ئایەتی: ﴿ وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الأَرْضِ أُمَماً ﴾ (الأعراف: ١٦٨).
(نابلسی) دەڵێت: ڕشانەوە لەخەودا گەڕییە، ئەگەر بینی لەخەودا تووشی بوە گەڕدەبێ، ئەگەر ڕشانەوە لەشارێکدا بڵاوبوەوە سزایەکە لەلایەن دەستەڵاتدارەوە دێت.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گۆڕو گەڕیو بیدعە چونکە مردنو تیاچوونی تێدایە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەر یاخود غەرامەیەك لەلایەن دەستەڵاتدارەوە بکرێ.
*ئەگەر بینی لەوڵاتو شارێکدا نەخۆشی ڕشانەوە بڵاوبوەوە جەنگ دەکەوێتەوە تێیدا.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: ڕشانەوە بەڵگەیە لەسەر تەوبە بەویستی خۆیو ئەگەر نەیتوانیو ڕقی لەتامەکەی بوەوە لەسەر ئەو ڕقو نکوولییە.
*ئەگەر بەڕۆژوبوو ڕشایەوە، پاشان ڕۆچوو تێدا قەرزارەو دەتوانێ بیداتەوە بەلام نایداتەوەو تاوانبار دەبێ.
*ئەگەر شیری خواردەوەو ڕشایەوە ڕشانەوەی شیرو هەنگوینبوو تەوبەیە، ئەگەر گەوهەری قووتداو کاتێ ڕشایەوە هەنگوینبوو فێری تەفسیرو ڕاڤەی قورئان دەبێت، ئەگەر ڕشانەوەکەی شیربوو لەئیسلام پاشگەز دەبێتەوە، ئەگەر ڕشانەوەکەی خواردنبوو شتێك بەمرۆڤێك دەبەخشێ، ئەگەر دیسان ڕشایەوە لەبەخشینەکەی پاشگەز دەبێتەوە.
*ئەگەر بادەیخواردەوەو سەرخۆشنەبوو، پاشان ڕشایەوە ماڵو سامانێکی حەرامدەبات، ئنجا پاشگەزدەبێتەوە لێی.

*ئەگەر سەرخۆشبوو رشایەوە رژدەو پارەو پوول خەرج ناکات بۆ منداڵەکانی، مەگەر بەئەندازەیەکی کەم نەبێتو پاشگەزدەبێتەوە لەخەرجی.
*ئەگەر بینی ریخۆڵەکانی هاتنەدەرەوە بەڵگەیە لەسەر مەرگی منداڵەکانی.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر قرقینەو رشانەوەیەکی زۆری هەبوو بەڵگەیە لەسەر مردنی.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی رشایەوەو رشانەوەکەی خوێنبوو بەئەندازەیەکی زۆرو رەنگی خوێنەکە گەشبوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی منداڵێکی دەبێت، ئەگەر خوێن لەدەفرێکدا لەبەری رۆیی کورەکەی دەژی، ئەگەر خوێنەکە بەسەر زەویدا رژا کورەکەی بەخێرایی دەمرێ، ئەو خەونە بۆ هەژار ماڵو دەستەڵاتێکی زۆرەو بۆیەکێك بیەوێت مرۆڤێك بخەڵەتێنێ خراپە چونکە کاروبارەکانی دەردەکەون.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەتەشتێکدا رشایەوە لەگوناهو تاوان تەوبەدەکات، ژنێك ماڵو داراییەکی حەرامی لێوەی دەستدەکەوێت.
*ئەگەر رشانەوەکە تامو چێژی خۆشبوو بەئاسانی هاتەدەرەوە تەوبەدوکات بەویستی هاورێکەی لەخراپە، ئەگەر قورسوگرانبوو و بۆی تامی ناخۆشبوو تەوبەو پەشیمانیەکەی بەزۆر دەبێ بەهۆی سزایەکەوە تووشی دەبێت لەجەستەو ماڵو بژێویدا، هەروەها رشانەوە گەڕانەوەی ئەوشتەیە بۆ هاورێکەی کەبەناحەق لێی وەرگرتوەو ئەمەش تەوبەیە.
*ئەگەر رشایەوەو رشانەوەکەی خوێنبوو لەگوناهێك تەوبەدەکات یان لەماڵو دارایی حەرام یا ئەسپەردەکردنی ئەمانەت کەلەئەستۆیدایە.
*ئەگەر خوێنی خواردەوە بەڵام شیرو هەنگوینی هەڵهێنایەوە تەوبەیە لەگوناهو تاوانو ستەم.
*ئەگە رشایەوەو زەرداوێکی پیسی تێدابوو لەسەرپێچی پاشگەزدەبێتەوە بەسزایەك.
*ئەگەر بەڵغەمبوو رشانەوەکەی لەخۆیەوە دەگەڕێتەوە.
*ئەگەر بینی رشانەوە دەخوات ماڵو سامانو ناوبانگ دەردەکات.
*ئەگەر رشانەوەیەکی زۆر رشایەوە دەمرێ یان نزیکدەبێتەوە لەمردن.
*ئەگەر بینی کاتێ رشایەوە خواردنێکی پاكو بێگەردبوو یان خوێن

یاخود بەڵغەمبوو بەڵگەیە لەسەر خێرو ئاسانی.
* ئەگەر خوێنێکی زۆری هەڵهێنایەوە بۆ هەژار بەڵگەیە لەسەر ماڵو دارایی یا خەوبینەر منداڵیدەبێت یان ئاوارەو غەریبێکی خزمی لەسەفەر دەگەڕێتەوە، ئەگەر خوێنەکە دەکەوتە نێو دەفریك کوڕە پەروەردەوگەورە دەبێ، ئەگەر کەوتە سەزەوی هەردووکیان بەخێراییو کتوپڕ کۆچی دواییدەکەن.
* رشانەوە بۆ مردوو بەڵگەیە لەسەر مردن.
* رشانەوە گسکدانە یاخود جۆگەلەیە.
* ئەگەر رشایەوەو مارێکهاتەدەرەوە نەخۆشیشبوو دەمرێ، ئەگەر لەشساغبوو لەدوژمنەکەی جیادەبێتەوە.
* هەروەها دەڵێن: رشانەوە ماڵو سامان خەرجکردنە بەهۆی خواردنەوە.
* هەموو رشانەوەیەك بۆ هەژاران بەڵگەی خێرەو بۆ دەوڵەمەند باش نییە بەڵکو زیانە لەماڵو دارایاندا، ئەگەر پادشایەك بینی رشایەوە باج دەگێڕێتەوە بۆستەملێکراوان، رشانەوە بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی ئەمانەت بۆ خاوەنەکانیو بڵاوکردنەوەی نهێنیو هەروەها رەواندنەوەی ئەوەی لەناخیدایەو ئەگەر نەخۆشبوو کۆچدەکات.

## رف

**رفین:** پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرین)و دەڵێن: لەخەودا بینیم وەك بفڕم لەنێوان ئاسمانو زەویدا، ئەویش وتی: تۆ زۆر بەپێ دەڕۆیت.
* ئەگەر بینی رفی بەسەر چیایەکدا دەستەڵات بەدەستدەهێنێو کەسانی گەورە ملکەچیدەبن.
* ئەگەر بینی دەڕفێ ئەگەر شیاوی دەستەڵاتبوو بەدەستیدەهێنێت، ئەگەر لەسەر شتێك کەوتەخوارەوە ئەوە دەبێت بەخاوەنی ، ئەگەر شایان نەبوو بەڵگەیە لەسەر نەخۆشییەك رووی تێدەکاتو لەمەرگ نزیکدەبێتەوە یان دەکەوێتە هەڵەیەکەوە.
* ئەگەر لەسەربانێکەوە رفی بۆسەربانێکیتر ژنەکەی وازلێدەهێنێ بۆ ژنێکیتر.
* هەندێکدەڵێن: رفین بەڵگەی سەفەرە ئەگەر بەباڵبوو، گواستنەوەیە لەحاڵێکەوە بۆ حاڵێکیتر.

*ئەگەر لەرفیندا گەیشت بەکۆتاترین پلــه لەســـەفەرەکەیدا خێـــری دەستگیردەبێ.
*ئەگــەر لەزەوییەکــەوە چــوو بــۆ زەوییــەکیتر ڕێــزو شــکۆو چــاوڕوونی پێدەبەخــشرێ بــەپێی ئــەو گوتەیــەی دەڵێــت: "ئەگــەر شــوێنێکت بــەدڵبوو رووی تێبکە".
*ئەگەر لەنزماییەوە رفی بۆ بەرزایی بــەبێ بــاڵ هیــواو ئــاواتی بەدەســتدەهێنیو بەئەنــدازەی بــەرزی شکۆدار دەبێ.
*ئەگــەر وەك کــۆتر رفــی شــکۆمەندیو پلەوپایە بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر بینی رفی هەتا لـەنێو بەرگــەی ئاسمانــدا ونبــوو پاشــان ئەگەڕایــەوە دەمرێت.
*ئەگــەر لــەماڵی خۆیــەوە بــۆ مــاڵێکی نادیــار رفــی لەلانــەو مــاڵی خۆیــەوە دەگوێزرێتەوە بۆ نێو گۆڕەکەی.
*هــەروەها دەڵــێن: ســواربوونی هــەموو جۆرە ئاژەڵێك یان هۆکاری گواستنەوە بەدەســتهێنانی نیــازو هیــواو ئاواتــە، ئەگــەر بەباشــی ســوارینەبوو بەڵگەیــە لەســەر شــوێنکەوتنی ئــارەزوو، ئەگــەر سوارییبوو بــاش ڕۆیــی پێــوەی لەفتنــەو ئاشــوبو ئــارەزوو پــارێزراودەبێو بەهیوای خۆیدەگات.
*ئەگەر بینی سواری گەردنی مرۆڤێك بوە دەمرێتو تەرمەکەی هەڵدەگیرێ.
*هــەروەها دەڵــێن: ســواری گــەردنی مرۆڤبــوون بەڵگەیــە لەســەر کــارێکی قــورس‌وگران ، ئەگــەر بەریدایــەوەو خــستیەخوارەوە داواوخــوازی هــەولێو داوای بەجێنەهاتوە.
*گەڕانــەوە لەســەفەر بەڵگەیــە لەســەر بەجێهێنانی ئەرکێکی ئەستۆ. هــەروەها دەڵــــێن: بەڵگەیــــە لەســــەر دەرولێکردنــەوەو قوتــاربوون لەغــەمو پــەژارەی خــراپو بەدەســتهێنانی نــازو نیعمــەت بــەپێی ئایــەتی: ﴿ فَانْقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِنَ اللهِ وَفَضْلٍ لَمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ ﴾ (آل عمران: ١٧٤).
*واتــای تەوبــە پاشــگەزبوونەوەیە لەسەرپێچی.
*غارغارێن بەسەرو ولاخەوەیان راکردن بەهەردوو قاچ بەڵگەیە لەسەر خێراییەك بەدووی دەکەوێت لەگەل قوتــاربوونو هێمنی لەوەی کەلێی دەترسێ بەپێی وتــەی(موســی) هــەروەك پــەروەردگار لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿فَفَرَرْتُ مِنْكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ﴾ (الشعراء:٢١).

*گەیشتن بەویستو هیوا کاملّی بەلّگەیە لەسەر کەمیو تیاچوون.
*ئەگەر بەپانتایی ئاسماندا فڕی بەلّگەیە لەسەر ئەوەی سەفەر دەکات یان پلەوپایەیەك بەدەستدەهێنیّ.
*ئەگەر بازیدا لەشوێنێکەو بۆ شوێنێکیتر لەحالّێکەوە دەچێت بۆ حالّێکیتر.
*بازدانی دوور سەفەری دوورە، ئەگەر لەبازنەیەکدا پشتی بەست بەگۆچان پشت بەپیاوێکی بەهێز دەبەستیّ.
(نابلسی)دەلّێت: لەخەودا سەفەرە ئەگەر لەدواوەبوو سەفەرو پشوودانە.
*رفین بۆ کەسێك سەفەر دەکات بێکارییە.
*ئەگەر لەسەربانێکەوە رفی بۆ سەربانێکیتر لەپیاوێکی ناودارەوە دەچێت بۆ یەکێکیترو هەر سەربانێکیان بەرزبێت پلەوپایەو شکۆی بەرزترە.
*هەروەها دەلّێن: سەربان ژنە ، ئەوەی ببینیّ لەسەربانێکەوە دەچێت بۆسەربانێکیتر ژنەکەی بەجێدەهێلّیّ.
*ئەگەر ژنێك بینی لەمالّێکەوە رفی بۆ مالّێکیتر شوودەکات بەپیاوی ئەو مالّە.
*ئەوەی لەمالّێکی ناسراوەوە برفیّ بۆ مالّێکی نادیاری دوور دەمرێتو لانەیە قیامەتە.

*ئەگەر زیندانی بینی دەڕفیّ لەزیندان قوتاردەبیّ.
*هەروەها دەلّێن: ئەگەر رفین بەبالّبوونەوە سەفەرە، ئەگەر بەبیّ بالّبوو گواستنەوەیە لەحالّێکەوە بۆ حالّێکیتر یان لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر.
*ئەگەر کەسێکی ئاوارەی غەریب بینی رفی دەگەڕێتەوە بۆ ولاّتی خۆی، هەروەها دەلّێن: سەفەر زۆر دەکات.
*ئەگەر لەگەلّ بالّندەکاندا رفی لەخەودا هاوەلاّیەتی کەسانی غەریبدەکات.
*ئەگەر کەسێکی لەخۆباییو خاوەن هیواو ئاواتی بینی دەفڕیّ خەونەکەی بەتالّە.
*ئەگەر پێشبڕکێی لەگەلّ مرۆڤێکداکردو رفیو پێشکەوت دەیشکێنیّو پلەوپایەی پێشکەوتوو بەرزو بلّند دەبێتەوە.
*ئەگەر بینی بەسەر شاخێکدا دەڕیّ ئەوە دەستەلاّتو پلەیەك بەدەستدەهێنیّو دەستەلاّتدارانی گەورە دەوشکێنیّ بەبیّ ماندوبوونو ملکەچ دەبن بۆی.
*ئەگەر بینی دەفڕیّو ئەگەر شایستەی دەستەلاّتبوو بەدەستیدەهێنێت، ئەگەر

کەوتەخوارەوە بەسەر شتێکدا دەبێت بەخاوەنی ئەوشتە، ئەگەر گونجاووشیاونەبوو بۆ ئەوشتە لەئاینەکەیدا گوناهو هەڵەیەک ئەنجامدەدات و نەخۆشدەکەوێ.
*ئەگەر لەفریندا گەیشت بەویستو خوازی خۆی لەسەفەرەکەیدا خێری دەستگیردەبێ.
*ئەگەر لەبەرگەی ئاسماندا ونبوو نەگەڕایەوە دەمرێ.
*ئەگەر لەماڵێکەوە رفی بۆ ماڵێکیتر بەڵام ئەو ماڵەی تر نادیاربوو لەماڵی خۆیەوە دەچێت بۆ گۆڕەکەی.
*ئەگەر لەهەوادا فڕی نەخۆشدەکەوێ هەتا لەمەرگ نزیکدەبێتەوەو پاشان قوتاردەبێ.
*ئەگەر بینی بەرێکی دەرفێ کاروبارەکانی بەبێ ماندووبوون بۆبەجێدێت.
*ئەگەر بینی دەرفێو لەسەرزەوی بەرزبوەتەوەو سەری روو بەئاسمانو قاچی بۆ خوارەوە لەنێو ئەو هاوەڵانەدا کەروویان تێدەکات پلەوپایەی بەرزتردەبێ، لەنێو دەوڵەمەندو کرێکاراندا بەڵگەیە لەسەر پلەوپایە کەپێیدەگەن.

*بۆیەکێك ئاوارەو غەریب بێت بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی جارێکیتر ناگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی.
*ئەگەر بینی دەفڕێو دووباڵی هەیە بەڵگەی خێرە بۆ سەرجەم خەڵکی، ئەگەر هەژاربوو بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی ماڵو دارایيەکی زۆر.
*ئەگەر بینی بەبێ باڵ دەڕفێو لەهەوادا بەرزبوەتەوە بەڵگەیە لەسەر ترس‌وبیم کەوا رووی تێدەکات.
*ئەگەر بینی بەسەر ماڵانو کۆڵاندا دەڕفێ بەڵگەیە لەسەر بشێوی بەڵام کاروباری خۆی جێگیر دەبێت.
*ئەگەر بینی روو بەئاسمان دەڕفێ ئەگەر کەسێکی سادەبوو روو لەخانەوادەی ناودارو مەزندەکات.
*ئەگەر بینی لەگەڵ باڵندەکان دەڕفن لەنێو کۆمەڵێ غەریبدا دەگیرسێتەوە، ئەم خەوە بۆ خەڵکی بەد شەڕەنگێزیو خراپەیە.
*بۆیەکێك راو لەئاودا بکات بەڵگەیە لەسەر رووداني سزایەك، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ناواخنو ویستو خوازی.
*ئەگەر بینی دەڕفێو لەهەوادا بەرزنەبۆتەوە بەئەندازەیك لەسەر رووی

زوییەوە بەڵگەیە لەسەر سەفەرو گەڕانەوە.

*ئەگەر بینی بەویستی خۆی دەڕفێ و واز لەڕفین دەهێنێ ئەگەر نەیویست ئەمەش بەڵگەیە لەسەر خێرێکی زۆرو گەورە ئەنجامدان.

*ئەگەر بینی دەڕفێ و بەپشتاکەوتوە ئەگەر بەدەریادا دەڕۆیی یاخود وایدەویست بەڵگەیە لەسەر خێر، بۆ سەرجەم خەڵکی بەڵگەیە لەسەر بێکاریی و بۆنەخۆشیش بەڵگەیە لەسەر مەرگ.

*ئەگەر بینی دەڕفێ بەلام ناتوانێ و سەری روو بەزەوییەو قاچی بۆ ئاسمان بەڵگەیە لەسەر شەڕو خراپەیەك دێتە ڕێی.

*ئەگەر نەخۆشێك بینی دەڕفێ بەڵگەیە لەسەر مەرگی، بۆ سوارچاك بەڵگەیە لەسەر چاکی بزاوت و جموجووڵی و جێگیرنەبوونی لەشوێن و جێگەیەکدا، بۆ زیندانی و بەندیش ئازادکردنیانە.

*ئەگەر بینی لەدەستەبەرەیەکدا دەڕفێ و نوستوە لەسەر جێگەیەك یان شتێکیتر بەڵگەیە لەسەر توشبوونی بەنەخۆشی یاخود دەردو بەلایەك روو لە قاچەکانیدەکات.

*ئەگەر بینی لەنێوان ئاسمان و زەویدا دەڕفێ هیواو ئاواتی زۆردەبێ.

*ئەگەر بینی لەشوێنێکدا دەڕفێ و شوێنی رفینی رووپای ئاسمانە بەسواری یان بەپیادە دەڕوات بۆ جێگەیەك و پاشان سەفەردەکات و پلەوپایە بەدەستدەهێنێ بەئەندازی بەرزبوونەوەی لەزەوی، دەگونجێت هیواو ئاواتی زۆربێ ئەگەر رفینی زۆر بینی.

*دەگونجێت رفین بۆ بەدەستهێنانی زانیاری یان خراپەو شەڕبێت، بەدەستهێنانی کارێك کەماندوبوە بۆی یا وێڵی و هەرزەییەك لەکاتی تورەییداو ئەمەش شادی و خۆشییە بەپێی ئەو گوتەیەی دەڵێت: "فلانەکەس لەخۆشیدا ڕفی".

*هەروەها رفین بەڵگەیە لەسەر رەشبینی ئەگەر بەباڵ رفی ئەوە بەشکۆمەندی و رێزەوە سەفەردەکات، ئەگەر بەبێ باڵبوو بەنارەحەتی سەفەردەکات بۆ خۆی بەتایبەت ئەگەر لەشوێنێکی باشەوە سەفەریکردو لەشوێنێکی خراپ لایدا.

*ئەگەر لەشوێنێکی خراپەوە رفی پێچەوانەی ئەوەیە.

## رق

**رق و قین:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: رق و قین باش نییە ، چونکە خۆشەویستی نیعمەت و بەخششی خواییە و رق و قینیش پێچەوانەیەتی ، هەروەها پێچەوانەی نیعمەتیش نارەحەتیە و پەروەردگار نیعمەت و بەخششی بەسەر باوەڕدارانەوە باسدەکات بەهەڵگرتنی دژایەتی و جێگیرکردنی خۆشەویستی بەهۆی خۆشویستنی ئیسلامەوە کاتێ دەفەرموێت: ﴿إذ كنتم أعداء فألف بين قلوبكم فأصبحتم بنعمته اخوانا﴾(ال عمران).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر یەکێك لەخەودا بینی رقی لەکەسێکە یان کەسێك رقی لێیەتی بەڵگەیەکی خراپە بۆ سەرجەم خەڵك، چونکە رق و قین هۆکاری دژایەتی و دوژمنایەتییە و دوژمنان یەکتریان خۆشناوێت و هاوکاری یەك ناکەن.

* دەگونجێت رق و قین بەڵگەبێت لەسەر فەرمان بەچاکە و خۆ گرتنەوە لەخراپە، ئەگەر لەخەودا ئەوکەسە بینی کەبەئاگاو بێداری رقی لێیبوو بەڵگەیە لەسەر سینە تەنگی و تاقیکردنەوە بەکەسێك کەخۆشحاڵ نییە بەهاوەڵایەتیکردنی.

## رم

**رمان( رووخان - تەپین ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+بەدەستهێنانی پێداویستی.

+ناچارکردنی دوژمن.

+کوڕو هاوکار.

* ئەگەر لەئاسمانەوە قامچییەك دابەزی بەڵگەیە لەسەر سزاو خەشم و قین.

* قامچی دەستەڵاتدارە ، ئەوەی قامچییەکی پارچەپارچەکراوی رەشی سووورباوی بینی دەستەڵاتێکی باش بەدەستدەهێنێت ، ئەگەر پارچە پارچە نەبوو دەستەڵات و ئیشگەرییە.

* ئەگەر لەلێداندا قامچییەکە بچڕا دەستەڵاتەکەی بەسەر دەچێت.

* ئەگەر درزیبرد دەستەڵاتی زیاد دەکات.

* ئەگەر بینی بەقامچییەکەی لەگوێدرێژەکەیدا لەپەیداکردنی بژێویدا بانگی خوداوەند دەکات، ئەگەر لەئەسپێکی پێدا سواریبوبوو ویستی غاری پێبدات دوعا دەکات لەکارێکی قورس و گراندا.

* ئەگەر بینی قامچیەکی بەدەستهێنا پەنادەگرێ بەپیاوێکی عەجەمی کەپەیوەندی بەدەستەڵاتدارەوە هەیەو گوتارەکانی وەردەگرێ و فەرمانەکانیشی بەجێدەگەیەنێ.

* ئەگەر بینی بەقامچی لەپیاوێکدەداتو دەستی بەرزو درێژ ناکاتەوە ئامۆژگاریدەکات، ئەگەر ئازاری پێگەیاندو داچڵەکی سەرزەنشتیدەکات پاشان تەوبەدەکات، ئەگەر ئازاری پێنەگەیاند ئامۆژگاری وەرناگرێ، ئەگەر خوێنی لەبەر رۆیی لەکاتی لێداندا ئەوەستەمو زۆرداریيە ئەگەر خوێنی لەبەر نەڕۆیی ئەوە حەقو دادپەوەرییە.
* ئەگەر لێیداو پێستەکەی درزیبرد ئەوە لەیەکێکەوە بۆدووان زیاد دەبێت لەسەری بەوەی دەدرێتەپاڵی.
* ئەگەر خوێنی لێدراوی بەرکەوت ماڵێکی حەرام بەدەستدەهێنێت، هەروەها ئەگەر لێدراویش خوێنی لێهات هەر بەوچەشنەیە.
* ئەگەر قامچیەکە لەکاتی لێداندا لاربوو هەڵگەڕایەوە ئەقڵو ژیری واژوو پێچەوانەیە یاخود ئەوپیاوەی پەنای پێدەگرێ ناتەواوە.
* ئەگەر بینی دەستەلاتدار لێیدا بەقامچی سەد قامچی یان کەمتر یا زیاتر درهەمە بەئەندازەی قامچیەکان.

**رمو تیرهاوێژ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت:

رم هاوێژ نوێنەرە، ئەگەر بینی تیرێکی هاویشتو نەی پێکا نوێنەرێك دەنێرێ لەبۆ پێداویستی.
* ئەگەر رمەکە رێکبوو کتێبێکە قسەی حەقی تێدایە، ئەگەر لەقامیشی ناتەواوبوو گوتەی پووچو بەتاڵە ، ئەگەر ئەوەی ویستی بەجێی هێنا فەرمانەکەی بەجێدێت.
* ئەگەر پێکای ئەوەی وتویەتی بەجێی دەهێنێ.
* ئەگەر بینی ژنێك رمێکی ئاڕاستەکردو تێگرتو دای لەدڵی گاڵتەی لەگەڵ دەکاتو دڵی وابەستەی دەبێت ، ئەگەر رمەکە لەزێڕبوو نامەیەکە بۆ ژنێکی دەنێرێ ، یان بەهۆی ژنێکەوەیە.
* ئەگەر تیری واژووی یەکبوو نوێنەرێکن دڵیان نەرمو ناسكو گوتەیان شیرینە.
* ئەگەر تیرەکە نێزەکەی هەڵگەڕاوەبوو نوێنەرەکە گاڵتەیان پێدەکات.
* نێزەی تیر نامەیەکە هێزو توندوتیژی تیایە.
* نێزەی قورقوشم نامەیەکی سستو خاوە.
* ئەگەر رمەکە نێزەی تێدانەبوو دەیەوێت نامەیەك بنێرێ بۆ ژنێك بەلام نامەبەرێکی دەستناکەوێ.

*ئەگەر بینی ڕمێکی هەڵداو پێکای ئەگەر خوازیاری کوڕبێت دەبیێت.

*تیر گوتەی حەق‌و ڕاستییە لەگەڵ وەڵامدانەوەی گوێڕایەڵی پەروەردگار ناکات ئەگەر پێکانی گوتەکەی وەردەگیرێ خۆ ئەگەر نەیپێکا وتەکەی وەرناگرێ.

*ڕمێکی هەڵگەڕاوە ئەگەر ژنێک لەتیردانێکدا بینی هەڵگەڕانەوەی مێردەکەیەتی لێی.

*ئەگەر کەوانێکی بینی تیری لێوە هەڵدا کەوانەکە باوکەو دەگونجێت تیرەکە پیاوێک بێت کەسێکیتر پەروەردەی کردبێ‌و ڕم نیشانەیە.

*ئەگەر تیرێکی بەدەستیەوە بینی دەستەڵات‌و شکۆمەندی‌و ماڵ‌و سامان بەدەستدەهێنێ.

*هەروەها وتراوە: ئەوەی تیرێک بەدەستی خۆیەوە ببینێ هەواڵێکی خۆشی پێدەگات.

*پیاوێک بینی تیر هەڵدەدات خەوەکەی بۆ ڕاڤەکارێکی خەوگێڕایەوە ئەویش وتی: تۆ کەسێکی دووزوبانی.

## ڕو

**ڕوان‌و دەرهاتنی حەشیش:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر مردن، ئەگەر بینی حەشیش بەسەرجەم لەش‌ولاریدا دەرهات بەڵام لەش‌ولاری دانەپۆشی‌و زیانی پێنەگەیاند ئەو ساڵە فەڕوپیت بەدەستدەهێنێ، ئەگەر گوێچکەو چاوی داپۆشی بەڵگەیە لەسەر کەم‌و کوری ئاینەکەی، بەهەمان شێوە دەرهاتنی پەڕوباڵ لەلاشە بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی ماڵ‌و سامان یان جل‌وبەرگ، دەگونجێت سەفەرێکی بۆبێتە پێشەوە.

*ڕوانی حەشیش لەجەستەو لەش‌و لاسوودو دەوڵەمەندییە.

*ئەگەر شتێك ڕوا لەسەر سکی خراپبوو باش نییە ، خۆئەگەر نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر مردنی.

**ڕووبار:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی ڕێزدارە ئەگەر کەسێك چووەنێوی لەگەڵ خەڵکی گەورەدا تێکەڵدەبێ‌و ئاوخواردنەوە لەرووبار باش نییە بەپێی ئایەتی: ﴿ انَّ الله مُبتليكم بنهر ﴾ (البقرة: ٢٤٩).

*ئەگەر بینی لەمبەری ڕووبارەوە بۆ ئەوبەری بازیدا لەغەم‌و پەژارە قوتاردەبێ‌و بەسەر دوژمنەکانیدا زاڵدەبێت.

*هەروەها وتراوە : ڕوبار بەڵگەیە لەسەر سەفەر بۆ یەکێك بچێتە نێوی.

*هەروەها وتراوە: چوونە نێوی کاری دەستەلاتدارە، ئەگەر ئاو بەبازاڕێکدا ڕۆیی خەلکی دەستنوێژیان دەگرت‌و سوودیان لەئاوەکەی وەردەگرت ئەوە دادپەروەری دەستەلاتدارە بۆ ژێردەستەکانی ، ئەگەر بەسەربانەکاندا ڕۆیی‌و هاتە نێو مالەکان‌و قوماشەکانی تەڕکرد ستەم‌و زۆرداری دەستەلاتدارە لەژێر دەستەکانی، یان دوژمنێکە هەلدەکوتێتەسەر خەلکی.

*ئەگەر ڕوبارێکی بینی لەمالەکەی هاتەدەرەوەو زیانی بەکەس نەگەیاند چاکەیەکە لەخەلکیدەکات.

*ئەگەر بینی بوە بەڕوبار بەخوێن بەربوون (نەزیف) دەمرێ.

*ئەگەر چوە نێو ڕووبارێك تێکەڵ بەپیاوێکی گەورە دەبێ ئەگەر شتێکی پێگەیی لەوپیاوەوە غەم‌و پەژارەی پێدەگات ، بەهەمان شێوە ئەگەر ڕووبارەکە لێلبوو.

*ئەگەر لەئاوێکی سازگار ئاویخواردەوە خێرو ژیانێکی خۆش بەدەستدەهێنێ لەوپیاوەوە بەئەندازەی خواردنەوەی ئاوەکە.

*ئەگەر بینی ئاوی لێهەلدەگوزێ مال‌و سامان لەپیاوێکەوە بەدەستدەهێنێ بەئەندازەی گەورەیی‌و بچووکی ڕووبارەکە.

*ئەگەر بینی ڕووبارەکەی بڕی بۆلایەکیتر غەم‌و پەژارەو ترس‌وبیمی دەڕەوێتەوە ئەگەر قوڕو چلپاو یان شەپۆلی تێدابوو ، وەگەرنا ئەو پیاوە دەبڕێت بۆلای یەکێکیتر.

*ئەگەر بازیدا بەسەر ڕووبارەکەدا بۆ دەریاچەکەی لەخراپەی دەستەلاتدار قوتاردەبێت‌و سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی ئاوی دەریا دەبیات یان ئاژەلەکانی دەبات یاخود شتومەکی ئەوە زیانە بۆی.

*ئەگەر بینی ئاوێکی سازگار دێنە نێو مالەکەی بەلگەیە لەسەر مال‌و سامان‌و خۆشی ، هەروەها وتراوە ئەگەر دەولەمەندبێ ئەوەی بینی فەرووپیت بەدەستدەهێنێ‌و سوود دەگات بەخانەوادەکەی.

*ئەگەر ڕووبارێکی بینی لەمالی خۆیان هەلدەقولێ‌و ئاوی لێدەخۆنەوە ئەگەر دەولەمەندو ڕێزداربوو بەلگەیە لەسەر خێرو سوود بۆ خەلکی ئەو ولاتەو بۆیان خەرجدەکرێ‌و خەلکێکی زۆر ڕوودەکەنە مالەکەی‌و ئاتاجیان بەدەستدەهێنن.

*ئەگەر خەوبینەر هەژاربوو ژنەکەی دەردەکات یان کوڕەکەی بەهۆی داوێنپیسی یان کارێکی خراپەوە.
*روبار لەخەودا کارێکی چاكو رزقو رۆزییەکی بەردەوامە.
*روباری لێلٚ یان بۆگەن بەلگەیە لەسەر دۆزەخو ئەوەی لەخراپەی نزیکدەکاتەوە.
*روبار فتنەیە ، دەگونجێت بۆ سەرپێچیکار سەرپێچی بێتو بۆ چاکەکاریش بەلگەی پارێزراوی بێت.
*ئەگەر لەروبارەکانی (فورات)و (دجلە)و (نیل) ئاوی خواردەوە بەلگەیە لەسەر خێرو رزقو رۆزیو هاوسەرو شتی نایاب لەوناوچەو هەرێمەدا.
*ئەگەر روبارەکە لەولاتی خۆیدا نەبوو بەلگەیە لەسەر گۆڕانی دەولەتو چوونی هەندێکیان بۆلای هەندێکیتریان.
*ئەگەر بینی بەسەر ئاودا دەڕوات بەلگەیە لەسەر باشی نیەتو دلنیایی.
*روباری (کەوسەر) لەخەودا سەرکەوتنە بەسەر دوژمناندا بەپێی ئایەتی: ﴿ اِنَّا اَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ﴾ (الكوثر:١).
*ئەگەر لەئاوی (کەوسەر)ی خواردەوە زانیاریو کرداروو دلنیایی باشو شوێنکەوتنی پێغەمبەرو سوننەتی(ﷺ) بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر بێباوەڕبوو موسولٚماندەبێ، ئەگەر سەرپێچیکاربوو تەوبەدەکاتو لەبیدعەوە دەچێت بۆ سوننەت یان لەژنێکی خراپەکارو داوێنپیسەوە بۆ ژنێکی سالٚحو باش یان لەکاسبیەکی حەرامەوە بۆ کاسبیەکی حەلالٚ.
*ئەو روبارەی لەبەهەشتدایە بەلگەیە لەسەر رزقو رۆزی.
*روباری شیر بەلگەیە لەسەر فیترەت.
*روباری مەی بەلگەیە لەسەر مەستبوون لەخۆشەویستیو چاوپۆشین لەسەرپێچی.
*روباری هەنگوین بەلگەیە لەسەر زانیاریو قورئان.

**روباری (نیل) لە(میسر):** (نابلسی) دەلێت: ئەگەر بینی ئاوی لێدەخواتەوە زێڕ بەدەستدەهێنێ بەئەندازەی ئەو ئاوەی خواردوویەتیەوە.
*ئەگەر روباری (نیل)ی بینی هێزو دەستەلات بەدەستدەهێنێ.

**روحکێشان:** (نابلسی) دەلێت: لەخەودا بەلگەیە لەسەر گەڕاندنەوەی ئەمانەت بۆ خاوەنەکەی یاخود چاکبوونەوەی نەخۆش یان قوتارو ئازادبوونی زیندانی لەزیندانەکەی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر یەککگرتنو کۆبوونەوە لەگەڵ کەسێکی شاوارەو غەریبدا.

## روو

**رووپامایی:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی روپامایی بۆ مرۆڤێك دەکات لەبۆ بەدەستهێنانی خۆشییەکی دنیا خراپو نابەجێیە.

*ئەگەر بینی روپامایی لەپێناوی بەدەستهێنانی زانستێکدا دەکات یاخود کاروپیەشیەك کەبیگەیەنێت بەچاکە رێزو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێتو ئاینەکەی باشدەبێتو بەداواو نیازی خۆیدەگات.

*هەروەها وتراوە: ئەگەر کەسێك کارێکی وابکات رانەهاتبێتو نەیکردبێت ملکەچیو رسواییە، خۆنەگەر روپامایی لەژنێکی ناسراوبوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خەوبینەر قوتار دەبێت لەدەستی دوژمن.

*رەفتاری رووپامایش لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستیو ئیسارو چاکەو خێر.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا هۆکارێکی حەرامە لەبێداریدا.

**رووپۆش ( پەچە ):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا کچێکی تەمەندرێژە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شارەزایی لەئایندا.

**رووپێو( مەساح ـ ئەندازەگیر ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پیاوێکە خەڵکی هەڵدەسەنگێنیو حەزدەکات بوەستێت لەسەری.

*ئەگەربینی رووپای زەوییەکی چێنراو دەگریێ حالو باری چاکەکاران بەسەردەکاتەوە ، ئەگەر مێوی پێوا حالی ژنەکەی دەپشکنیو بەسەریدەکاتەوە.

*ئەگەر دارێکی پێوا حالوباری ئەو پیاوانە بەسەردەکاتەوە کەئاینیان هەیە.

*ئەگەر شەقامێکی پێوا لەورێگەیەوە سەفەردەکات کەرووپای گرتوە، ئەگەر لەسەر رێگەی (حەج)بوو ئەوجا(حەج)دەکات ، ئەگەر شوێنێکی چۆڵەوانی پێوا لەغەمو پەژارەدا رۆدەچێت.

*ئەگەر زەوییەکی سەوزایی پێواو خاوەنەکەی نەناسراوبوو دەبێت بەچاکەکارو وەچەدار.

(نابلسی)دەڵێت: ئەرگەر رووپای لانەو ماڵی مرۆڤێکی پێوا حالی ئەو مرۆڤە بەسەردەکاتەوە.

**رووتــی( بــیٚ جلوبــەرگی )**: ((ئــیبن ســیرین) دەڵێــت: ئەگــەر بینــی جلوبەرگــەکانی لــەخۆیکردەوە دوژمنێکــی پــەنهانی دەبێــتو لەرووکاریــشدا خۆشەویــستیو ئامۆژگــاری دەردەخــات، خوداوەنــد دەفەرموێ: ﴿يَا بَنِي آدَمَ لاَ يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنْــزِعُ عَنْهُمَــا لِبَاسَــهُمَا﴾ (الأعراف:٢٧).

*ئەگەر بینی لەشوێنێکی قەرەباڵغدا رووتبووەتەوە ئابرووی دەچێت ، ئەگەر لەشوێنێکدا بەتەنیا هەر خۆی رووتبوو بۆکەموکوڕی دەگەڕێت بەڵام بەئومێدی خۆیان ناگەن.

*ئەگــەر ژنێــك جلوبــەرگی رەشــی لەخۆی داماڵی بەڵگەی بەیانییە چونکە ژن بەشەو راڤەدەکریٚ، ئەگەر شەوێکی کەم تاریکبوو ئەگەر جلوبەرگی ژنەکە سپیبوو شەوێکی مانگەشەو دەبێت.

*خۆرووتکردنــەوە بەڵگەیــە لەســەر جلوبــەرگی نــویٚ، ئەگــەر نەخۆشــێك روتبــووەوە لەجلوبەرگــەکانیو بــەزۆر بردیان دەمرێت.

*رووتبوونــــــەوەی ژنـــــیش لەماڵهاتنــەدەرەوە دوورکەوتنەوەیــە لێی.

**رووخــانی لانــەو مــاڵ**: (ئــیبن ســیرین) دەڵێــت: ئەگــەر بینــی ماڵێــك رووخــا بەسەریا ماڵو سامانێکی زۆر بێشومار بەدەستدەهێنیٚ.

(نابلــسی)دەڵێــت: بینینــی بەڵگەیــە لەســەر مردنــی خاوەنەکــەی. مــردنیش بەڵگەیە لەسەر رووخاندنی لانەو ماڵ.

*ئەگــەر بینــی ماڵێــك دەڕوخێنــیٚ یــان بینایــەکی کــۆن غــەمو پــەژارە رووی تێدەکات.

*ئەگەر بینــی ماڵەکــە رووخــا بەســەریا یاخود هەندێکی رووخا مرۆڤێك لەوماڵــە دەمریٚ یان خاوەنەکــەی تووشــی بــەڵاو نەهامەتیەکی گەورە و کاریگەر دەبێت.

*ئەگەر ژنێك بینــی ســەربانی ماڵەکــەی رووخا مێردەکەی دەمریٚ.

**رووخــسار ( کــوڵم )**: (ئــیبن ســیرین) دەڵێــت: جــوانی رووخــسار بەڵگەیــە لەســــەر فــــەڕوپیتو دەرووی خێــــرو ناشــیرینی بەڵگەیــە لەســەر نەخۆشــیو خراپە.

*هــەردوو کــوڵم بەڵگەیــە لەســەر کــاری پیــاو ، ئەگــەر کــوڵمی بــەفراوانی بینــی لەئەنــدازەی خــۆی زیــاتر زیــادبوونی غــەمو پەژارەیــەو دابــەزینی پلەوپایــەو شانو شکۆیە.

**رووخساری مرۆڤ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پێستی مرۆڤ نهێنیەتیو رەشی پێست لەلێکدانەوەدا شکۆمەندیو وازهێنانە لەئاین.

*ئەگەر بینی رووخساری رەشداگیرساوەوە جلوبەرگێکی سپی پۆشیوە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کچێکی دەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿وإذا بُشِّرَ احَدُهُم بالأنثى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسوداً﴾ (النحل: ٥٨).

*خەلیفە (مەهدی)(رەحمەتی خوای لێبێت) لەخەودا بینی رووخساری رەشداگیرساوە لەناکاو بەئاگاهاتو (ئیبراهیم)ی کوڕی (عەبدوڵلا)ی (کرمانی)بانگکردو خەونەکەی بۆ گێڕایەوەو ئەویش وتی: کچێکت دەبێت، ئنجا ئەو ئایەتەی بۆ خوێندەوە هەر ئەو شەوە کچێکیبوو زۆر خۆشحاڵبوو خەلاتی باشیدا بە(ئیبراهیم).

*ئەگەر بینی رووی رەشداگیرساو جلەکانی پیسبوو خەونەکەی بەڵگەیە لەسەرئەوەی درۆدەکات بەدەم پەروەردگارەوە.

*ئەگەر بینی رووخساری رەشداگیرساوە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرن)و دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی رەشم بینی،پیاوێکیتر دەیشت، ئەویش وتی: مردنی بێباوەڕییەتیو رەشی ماڵو سامانیەتی ئەوەش بەپێوە دەیشت بەماڵوسامانی فریوی دەدات.

*دەگێڕنەوە پیاوێك بە(ئیبن سیرین)ی وت: لەخەودا بینیم پیاوێك بەزنجیر هەڵواسرابوو لەئاسماندا نیوەی لەشولاری رەشبوو نیوەشی سپی، کلکێکی درۆزنی گوێدرێژی پێوەبوو.

(ئیبن سیرین)وتی: من ئەو پیاوەم، نیوەی سپی لاشەم ئەوانەن بەرۆژ دێن بۆلام، نیوە رەشەکەی ئەوانەن بەشەو رووم تێدەکەن و زنجیرەکەش پێی هەڵواسراوم لەئاسمانەوە یادوزیکری منە هەمیشە روو بەئاسمان بەرزدەبێتەوە ، کلکەکەش قەرزە لەسەرم کۆدەبێتەوەو مردنمە، خەونەکەی بەوشوێوەیەبوو کەلێکیدایەوە.

*هەروەها دەڵێن: ئازایەك بینی رووخساری رەشداگیرساوەو راڤەکارێك

پێـــی وت: بەڵگەیــــە لەســــەر ترسنۆکبوونت.

*پیاوێك هـات بۆ لای (ئـیبن سیرین)و وتـــی: ژنــێکم دەستنیــشانکردووەو لەخەودا بەرەشـیو بچووکی بینیومـە، ئـەویش وتـــی: کورتیەکـەی کـورتی باڵایـــەتی رەشیەکەشــی مـــاڵو ســامانیەتی، زۆری نــەبردو مــردو پیاوەکەش بوو بەمیراتگری.

*دەگێڕنــەوە پێغەمبــەر(ﷺ) لەخــەودا ژنێکـی رەشـی سـەروقژ رووتـی بینـی لە(مەدینە) هاتە دەرەوەو هەتاگەیشت بە(جەحفە)، پێغەمبەر(ﷺ) بەم چەشنە لێکیدایەوە: نەخۆشی شاری (مەدینـە) دەگوێزرێتەوە بۆ (جەحفە)[1].

*پیاوێك گێڕایەوە لەخـەودا بینیویـەتی منداڵێکی بۆ نێردراوە کـاتێ بـەئاگاهات خەڵوزیان بۆ نارد.

*ئەگــەر ژنــی رەش پێــستی بینــی هاتبوونەســەری خێــر رووی تێـدەکات بــەهۆی بینینــی زۆری رێــزدار بــەلام

لەرەگــەزی دوژمــن، رەنگــی ســوور پلەوپایەو خۆشحاڵییە.

*هــەروەها دەڵــێن: ئەگــەر لەگــەڵ ســـوورییەکەدا ســـپێتی تێکـــەڵبوو خاوەنەکــــەی شــــکۆمەندیو رێـــز بەدەستدەهێنێت.

*رەنگـی زەرد نەخۆشـییە، هــەروەها وتــراوە: ئەگــەر بینـی رەنگـی زەرد هەڵگەڕاوەو بەڵـەك بەڵەکە لەقیامەتـدا رێنومایی دەدرێتو لەکەسە نزیکـەکان دەبێــت.زەردی رووخــسار بەڵگەیــە لەسەر غەمو پەژارە تووشی خەوبینـەر دەبێت.

*ســـپێتی رەنــگ : ئەگــــەر بینـــی رووخــساری زۆر ســپیبووە ئاینەکــەی بـاشو جێگیر دەبێـت لەسـەر ئیمـان ، ئەگـەر رەنگـی کـوڵمو گۆنـای سـپیبوو شکۆمەندیو رێز بەدەستدەهێنێ.

*دەگێڕنەوە پیاوێکی لاو کـوڵمی خـۆی بەســوور بــەدیکرد وەك ژنــان، لــەنێو ژناندا دانیـشتبوو تووشـی ئابڕوچـوونو زینابوو.

(نابلــسی)دەڵێــت: ئەگــەر لەخـــەودا بەباشی ببینێت بەڵگەیە لەسەر باشـی حاڵوبـاری لــەدنیاداو مژدەیـە لەگـەڵ خۆشیو شادی.

---

[1] (بوخاری)(٣٠٣٨)و(ترمذي)(٢٢٩٠)لەفەرموودەیەکی (عەبدوڵلا)ی کوڕی (عومەر) (رەزای خوای لێبێت).

*ئەگەر رووخساری بەرەشی بینی ئابڕووە.

*زەردی رووخسار بەڵگەیە لەسەر ملکەچیو حەسوودی، دەگونجێت زەردی دووڕوویی بێت ، چونکە زەردی نەخۆشییەو نەخۆشیش دووڕوویییە هەروەها دەڵێن: زەردی بەڵگەیە لەسەر بەندایەتی بەپێی ئایەتی: ﴿ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ﴾ (الفتح: ٢٩) ئەمەش زەردی رووخساریانە.

*ئەگەر کەسێکی رەش پێستی بینی رووخساری سپی بوەتەوە بەڵگەیە لەسەر دووڕوویيو کەمی شەرمی.

*ئەگەر رووخساری بینی رەشبوەو لاشەی سپی نهێنی باشترە لەدیارو بەرچاوی ، ئەگەر دەمو چاوی سپیبوو بەڵام لەشو لاری رەش کاری دیارو بەرچاوی باشترە لەنهێنی.

*ئەگەر بینی موو لەدەموچاوی هات لەشوێنێکدا لەبێداریدا مووی لێنەهاتبوو قەرزێکی زاڵەو پلەوپایەی دادەبەزێنێ.

*ئەگەر رووخساری گۆڕاو جوانی دیارنەما بەڵگەیە لەسەر کەمو کوڕیو دەگونجێت لەوانەبێ زۆر گاڵتەو گەپو شۆخی ئەنجام دەدات، چونکە ئاوی روویدەبات.

*ئەگەر گۆشتی کولمەکانی بینی رۆییوو بەسواڵکردنو دەروودووکردن دەژیو لەفەرموودەیەکدا هاتوە: "ئەوەتان بەردەوام سواڵدەکات کاتێ دەگات بەپەروەردگاری رووخساری گۆشتی پێوە نەماوە"[1].

*ئەگەر تاریکایی لەرووخساریدا بینی یاخود ناڕێکی بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی ئاینەکەیو کەمو کوڕی لەشکۆمەندیدا.

*ئەگەر دەموچاوی شینهەڵگەڕا تاوانبارە بەپێی ئایەتی: ﴿ وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴾ (طه: ١٠٢).

*ئەگەر رووخساری گەورەبوو بەڵگەیە لەسەر رێنومایيو شکۆمەندیەتی.

*ئەگەر رووخساری ئارەقی دەردا بەڵگەیە لەسەر عیشقو خۆشەویستی.

*ئەگەر رووخساری بینی سوورو گرژبوو بەلایەك رووی تێدەکات یان غەمو پەژارە رووی تێدەکات.

*ئەگەر کەسێك رووی لێوەرگێڕا کارێکی لێدەبینێ خەشمو قینی لێدەبێت.

---

[1] (مسلم) (١٠٤٠/١٠٣/١٤٠/٤) و (بوخاری) (١٤٧٤) وەك خۆی.

*ئەگـەر ژنێـك بینـی رووخـسارو دەموچـاوی بەرەشـی بنـی مەنجـەڵ رەشبوو مەرگی مێردەکەیەتی ، ئەگەر بینی بەسپێتیو بۆنی لەخۆیدا باشی خۆیو مێردەکەیەتی.

*رووخـساری گـەشو بـزەو خەنـداویو سـپێتی بەڵگەیـە لەسـەر باشـی حـاڵی خاوەنەکـەی ئەگـەر زینـدوو یـان مردووبێت.

*جوانی رووخساری ژن یا منداڵ یاخود ئەسـپ بەڵگەیـە لەسـەر فـەرپیتو بەپێچەوانەشەوە.

*ئەگـەر بینـی خـاوەنی دووڕووە لەخەودا بەڵگـەی چارەنووس خراپییە بـەپێی گوتـاری پێغەمبـەر (ﷺ): "خوداوەنـد تەماشـای کەسـی دووڕوو ناکات"[1].

*ئەگـەر بینـی بـوە بـەخاوەنی چـەند روویـەك بەڵگەیـە لەسـەر پاشـگەزبوونەوەی لەئیـسلام بـەپێی ئایـەتی: ﴿ الملائكـة يـضربون وجوههم وأدبارهم ﴾ (محمد: ٢٧).

*ئەگەر زانـابوو لەبەشـەکانی زانیاریـدا هەڵسوکەوت دەکات.

*دەمو چـاو گرژکـردنو گریـانو ناشـیرینکردنی یـاخود رەشـی بەڵگەیە لەسەر نەمانی پلەوپایەو درۆ.

*ئەگـەر لەهـەردوو لاجانـەکانی قـژی جـوانی بینـی پیـاوێکی سینەسـافەو ئەگەر هەر قـژی پێوە نـەبوو پیـاوێکی سووكو هیچو پووچە.

*قلێشبردنی دەمو چاو کەمی شەرمە.

*ئەگـەر رووخـساری خـۆی بەتـەپڕیو گەشـاوەیی بینـی خـاوەنی شـەرمو حەیایە، بەدیو خراپیو ناقۆڵایی دەمو چاو کەمو کورپییە.

**رووشـاندن:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: ئەگەر لەخەودا بینی مرۆڤێك ئەندامێکی بریـندارکرد لـەماڵو دارایـیو هەنـدێك لەخزمەتەکانیدا زیانی پێدەگەیەنێت.

*ئەگـەر رووشـاندنەکە کـێمو خـوێنی لێهـات روشـێنەر سـەبارەت بەکەسـی رووشاو دەدوێتو قسەدەکات، پاشـان رووشاو ماڵو سامانی دەستدەکەوێت.

*ئەگـەر بینـی رووەمـەتی رووشـاوە بەخێراییو کتوپڕ دەمرێت.

*هـەموو شـوێنەوارێکی رووشـانیش لەجەستەدا کێمو زوخمی تێدابێت ماڵو دارایییە.

*هـەموو زیادەیـەکیش لەلـەشو لاردا ئەگەر زیـان بەخاوەنەکـەی نەگەیـەنێت زیادەی نازو نیعمەتە.

[1] (بوخاری)و (مسلم) بەدەسـتەواژەی نزیك لەو دەستەواژەیە گێراویەتیەوە.

(نابلسی)دەڵێت: رووشان لەخەودا زیانە لەماڵو داراییدا، رووشانیش بەڵگەیە لەسەر نیشانەی خراپو لەمرۆڤدا لەبەخیلیو خراپەو بێبڕوایی، رووشاندنیش رەخنەو نکوولییە لەقسەو گفتوگۆدا.

**رووگرژ:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا رووی گرژبوە کچێکی دەبێت.

**رووگەشی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بۆ زانایانو پیاوچاکان بەڵگەیە لەسەر رووتێکردنو گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی، بۆ کەسانی تریش لەروو بەخەندەو گاڵتەبازو پیاو خراپان بەڵگەیە لەسەر بێئاگاییو روو بەحەرام چوونو تێکەڵبوون لەگەڵ بیدعەکاران.

**رووکەشکراو بەزێڕ:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بینینی شتی رووکەشکراو بەزێڕ بەڵگەیە لەسەرماڵو لانەی رازاوەو قسەوگوتەی باشو راستگۆیی لەگوتەو کرداردا.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بیدعەو تیابردنی ماڵو سامان یان ئارەزوو بێئابڕوویی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کەنیسەو شوێنی خراپە.

**رووناشیرینی:** (ئیبن سیرین) دەڵێ: ناشیرینی رووخسارو شەقڵ شەقڵبوونی شەرمو حەیایەتی.

* ئەگەر بینی رووخساری تەڕوو جوانە خاوەنی شەرمەو پیسو پۆخڵیش ناتەواوییە.

* پیاوێك بینی بەلاو نەهامەتییەك رووی‌کردە خەڵکیو ئاژەلان، لەراقەکارێکی خەوی پرسی ئەویش وتی: فەرمانڕەوایان پشتی کۆمەڵێك دەشکێننو هەندێك زیندانی دەکەن.

* هەندێك لەفەرمانڕەوایان ستەمکاربوون ، یەکێك لە پیاوچاکان ئەو فەرمانڕەوایەی بینی رووخساری ناشیرینو ناقۆڵابوەو رووی وەرچەرخاندوە بۆ دواوەو شەلەو دەستو قاچی براوەو گوێی لێبوو ئەم ئایەتە دەخوێندرایەوە: ﴿ألم تر كيف فعل ربك بعاد (٦)إرم ذات العماد﴾ (الفجر: ٦ــ ٧)خەوەکەی بۆ راقەکارێکی خەوگێڕایەوە ئەویش وتی: ئەم فەرمانڕەوایە تیادەچێت هەروەك چۆن خوداوەند (عاد)ی لەناوبرد، دوای بیست رۆژ موڵكو دەستەلاتو ماڵو سامانی تیاچوو.

**رووی شمشێر:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+پاراستنی ماڵو بۆداواکاری.
+ماڵ بەفیڕۆدان.
+پاراستنی نهێنی.

## رۆ

**رۆچوو لەخەودا:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: رۆچوو لەخەودا دۆڕاوە لەکاتی بێداریدا.

**رۆچوون بەنێو زەویدا:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا سەفەرێکی دووبارەیە یان خستنەدوای ئەوەیە کەزەوی بەڵگەیە لەسەری بەخۆشەویستی یان هاوسەر.

*ئەگەر بینی لەزەویدا ونبوو بەبێ هەڵکەندنو زۆر قوڵبوو هەتا وایزانی سەرناکەوێ لەخۆی بایبوە بەداواخوازی دنیاو لەوەدا دەمرێ.

**رۆژ(خۆر):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: رۆژ لەبنەڕەتدا فەرمانڕەواوکاربەدەستێکی مەزنە، چونکە لەئاسماندا رووناکترین پێکهاتەیە وێڕای سوودو قازانجی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر فەرمانڕەوای ئەو شوێنە کەخەونەکەی تیا دەبینرێو لەسەرووی ئەوەوە پەروەردگاری مەزنە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەستەڵاتی خەوبینەر ئەگەر بەتایبەتی بینی بەدەر لەکۆمەڵ وەك میرو مامۆستاو باوكو هاوسەر ئەگەر ژنبوو.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنێکی بەرێز وەك هاوسەری فەرمانڕەواو سەرۆك یا گەورە یاخود کچەکەی یان هاوسەری خەوبینەر یا دایكو کچی شۆخو شەنگی.

*بوێژو شاعیران جوانی کچانی شقڵنەشکاو بەخۆر دەچوێنن.

*هەروەها دەڵێن: لەخەوەکەی (یوسف)(سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەیە لەسەر دایکی ، هەروەها دەڵێن: بەڵکو بەڵگەیە لەسەر هاوسەرەکەی باوکی کەپوریبوو. یان دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر داپیرەی، یان لەسەر باوکیو مانگیش لەسەردایکی هەموو ئەمانەش لەلێکدانەوەدا شیاوو گونجاون.

*ئەگەر رۆژ بەڵگەبوو لەسەر باوك بەهۆی سوودو چاکتربوونی لەمانگ لەرووناکیو وزەدا، ئەگەر بەڵگەبوو لەسەر دایك بەهۆی مێینەییو نێرێتی مانگ، ئەو روداوەی لەخۆردا دەبینرێ لێکدانەوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەبەڵگەیەلەسەری.

*ئەگەر خۆر بینرا کەوت بەسەر زەویدا یاخود باڵندەیەك قووتیدا یاخود کەوتە نێو دەریاوە بەئاگر سووتاو رەشبوو

یاخود ونبوو لەرێڕەوی خۆی یان کەوتە ڕێــڕەوێکیتر ئــەوەی دەدرێتـــە پــاڵی دەمرێت.

*ئەگەر رۆژگیرا یـان هـەورێك رووناکی لێگــرت یــاخود تــەمو مــژ لــەدەوری کۆبــوەوە تاروونــاکی دابــەزی یــاخود لەئاسماندا جێگیربوون دەهاتو دەچوو بەڵگەیــە لەســەر رووداوێــك روودەدات لەوەی دەدرێتەپاڵی لەنەخۆشیو غەمو پــــەژارەو ناڕەحـــــەتیو خێرێکــــی نیگەرانکـــــەر مەگـــــەر ئــــــەوەی بەڵگەیەلەســەری نەخۆشــبێت لــەحاڵی بیداریدا مردنیەتی.

*ئەگەر بینی بەبێ هۆ رەشداگیرسا یان بێئەوەی بگیرێ بەڵگەیە لەسەر ستەمو زۆری ئــەوەی دەدرێتــە پــاڵی یــان بەڵگەیـــــە لەســـــەر بێبـــاوەڕیو ســــەرگەردانیەتی، ئەگـــەر خـــستیە دەستییەوە یـان گرتیـە بـاوەش یـان دابەزییەســـەر ماڵەکـــەی بـــەرووناکیو پرشنگی خۆیـەوە دەستەڵاتی پتـەوتر دەبێو شکۆو رێزدارتـر دەبێ ، یـاخود بـــژێوی پەیـــداکاری ئـــەو ماڵـــە دەگەڕێتـــەوە، ئەگـــەر لەســـەفەردابێت ئەگەر خۆی ئەوەی بینی یان خزمەتکار یـاخود هاوسـەرەکەی چـونکە گـەورەی هەموویانەو بەڕێوەبەری ماڵە ، وەگەرنا ژنی دووگیان کچی دەبێـت یـان کـوڕی دەبێت جیاوازیدەکات لەنێوان نێرومێـدا بەوزیادەیەی لەخەونەکەی وەردەگیرێ وەك ئـــــەوەی لەژێرکراســــــەکەیەوە بیشاریتەوە یان بیخاتە ژێر دەفرێك.

*ئەگـــــەر رەنگـــــی خۆرەکـــــە کـــــاتێ شاردرایەوە تاریکبوو ناپاکیو خیانـەت لەفەرمانڕەوا یان خانەوادەکەی دەکرێ ئەگـــەر وابـــوو، وەگــەرنا دەســتەڵاتدار دەستدرێژی دەکاتە سەر لەلایەن خـۆی یــان نەخۆشــی دەمــرێ یــان ئــافرەتی دووگیــان منــداڵی لەباردەچــێ یــاخود کوڕێکی دەبێ ئەو شتانە جیادەکاتەوە لەیەك.

*ئەگەر بینی رۆژ لـەرۆژئاواوە هەڵدێت یان دوای ئاوابوونی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هەڵهات بەڵگەیە لەسەر چۆنیەتی بەزیادبوونی بەڵگەکانی.

*دەگونجێت بەڵگـەبێت لەسـەر ئـەوەی دەخرێتەدرێتـــــە [دوای لــــــەوەی خوازیاریـەتی لەسـەفەرو دادپـەروەریو ســـتەمکاریی بەبێـــسوودو قـــازانج لەهەڵهاتنی یان کاتەکانی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نـسکۆی ئــەوەی دەدرێتــە پــاڵی لەنەخۆشــیو ناساغی.

*دەگونجێت ئاوابوونی دوای هـەڵهاتنی بۆیــەکێك ئــافرەتی دووگیــانی هــەبێت

بەڵگەبێت لەسەر مردنو لەبارچوونی منداڵەکەی دوای بوونی لەدایك.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گەڕانەوەی کەسێکی نادیار لەسەفەرو هێنانی ماڵو سامانی سەرنجڕاکێش.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گەڕانەوەی کەسێکی زیندانی بۆ زیندان دوای ئازادکردنی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر موسوڵمانبوونی بێباوەڕێك یان تەوبەکردنی کەسێك ستەمی لێکردووەو زۆی لێکردوە بگەڕێتەوە بۆسەرگەردانی.
*ئەگەر کەسێك وایبینی کرداری پەنهانو نهێنیدەکاتو کردارەکانی چاك یان خراپ بن بەڵگەیە لەسەر شاردنەوەی حاڵوباریو هیچ نهێنیەکی ئاشکرا نابێت بەهۆی ئاوابوونی خۆر لێی، مەگەر ئەوکەسە لەوشەوە ژنی هێنابێت ، ئەوکات هاوسەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆلای کەسوکاری.
*دەگونجێت هەڵهاتنی دوای ئاوابوونی بەڵگەبێت لەسەر تەلاقدانی ژنەکەیو گەڕاندنەوەی، بۆیەکێکیش هاوسەرەکەی دووگیانبێ لەسەر قوتارو رزگاربوون لەوەی هەڵیگرتوە، بۆیەکێك بژێوی ئەستەمو گرانبێت بەڵگەیە لەسەر دەروولێکردنەوەی بەتایبەت ئەگەر پیشەکەی بەتیشکی خۆرەوە بەسترابوو وەك جلشۆرو...بۆیەکێکیش نەخۆشبێت بەڵگەیە لەسەر مردنی بەهۆی ئاوابوونی ئەو سێبەرەی لەمرۆڤ دەچێ هەروەك خوداوەند دەفەرموێ:
﴿ ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلاً ، ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضاً يَسِيراً ﴾ (الفرقان)، بۆئەوەی لەجیهادو جەنگدایە بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتن، بۆئەوەی هەژارەو لەرۆژی زستاندایە بەڵگەیە لەسەر جلوبەرگو دەوڵەمەندی، لەهاویندا بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو نەخۆشیو تاو خۆڵەمێش.
*دانیشتنی مردوو لەبەرخۆرداو لەهاویندا بەڵگەیە لەسەرئەوەی تێدایە لەسزاو غەمو پەژارە بەهۆی هاوەڵایەتی فەرمانڕەوا یان ئەوەی خۆردابەزیوەتەسەری بەپێی حاڵوباری خۆی.
*ئەگەر بینی بوە بەخۆر دەستەڵاتێکی مەزن بەدەستدەهێنێت بەپێی تیشكو رووناکی.
*ئەگەر خۆرێکی هەڵواسراوی بەزنجیرێکەوە بەدەستهێنا

فەرمانڕەواییەکی پێدەسپێردرێو دادپەروەردەبێت تێدا.

*ئەگەر لەبەر خۆر دانیشتو چارەسەری خۆی تێداکرد دەستکەوتو نیعمەتێکی لەدەستەلاتدارەوە دەستدەکەوێ.

*ئەگەر بینی تیشکی خۆرو روناکیەکەی لەرۆژهەلاتەوە روو بەرۆژئاوا چوو ، ئەگەر شایستەی دەستەلاتبوو دەستەلاتێکی مەزن بەدەستدەهێنێت، وەگەرنا زانیاریەکی پێدەدرێ حاڵو باری هەموو ولاتێکی تیا باسدەکری.

*ئەگە بینی بوە بەشای خۆر یان زاڵبوە بەسەر خۆردا گوتەکانی پەسەند دەکرێ لەلای فەرمانڕەوای گەورە.

*ئەگەر خۆری بینی پاكو بێگەردەو لێی هەڵهاتوە ئەگەر دەستەلاتداربوو هێزو توانای لەدەستەلاتەکەیدا پێدەدرێ، ئەگەر میربوو خێری لەفەرمانڕەوای مەزنەوە دەستگیر دەبێ، ئەگەر کەسێکی ئاساییبوو رزقو رۆزییەکی حەلاڵی دەستگیردەبێ، ئەگەر ژنبوو هەلوێستێکی والەمێردەکەی دەبینێ شادو دلخۆشیدەکات.

*ئەگەر رۆژی بینی لەماڵەکەی خۆیدا هەڵهات، ئەگەر بازرگانبوو لەبازرگانیەکەیدا سوودو قازانجدەکات، ئەگەر داوای ژنیکردبوو ژنێکی جوان‌و شۆخ‌و شەنگ دەهێنێت، ئەگەر ژنێك خەوێکی ئاوابیبنێ شوودەکات‌و رزق‌و رۆزی مێردەکەی فراواندەبێت.

*تیشکی خۆر هەیبەت‌و شکۆو دادپەوەری فەرمانڕەوایە، ئەگەر خۆر بدوێت لەگەڵی پلەوپایەی بەرز.لەلایەن دەستەلاتدارەوە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی خۆر لەسەرسەری هەڵهات بەدەر لەجەستەو لاشەی کارێکی کاریگەر دەگرێتەدەست‌و دنیایەکی فراوانیدەبێت.

*ئەگەر خۆر لەلای قاچەکانیەوە هەڵهات بەدەر لەئەندامەکانی تری لاشەی رزق‌و رۆزی حەلاڵی بەهۆی کشتوکاڵەوە دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر خۆر لەسکی هەڵهات لەژێر جلەکانی‌و نەیاندەزانی تووشی بەلەکی دەبێت‌و بۆ سەرجەم ئەندامەکانی دیکەی وایە ئەگەر لەژێر جلەکانیەوە هەڵبێت.

*ئەگەر بینی سکی شەقیبردو رۆژی لێهاتەدەرەوە دەمرێت.

*ئەگەر ژنێك بینی ڕۆژ لەفەقیانەکەیەوە هاتە ناوی تەوقیدا ، پاشان لەدامێنییەوە هاتە دەرەوە شوودەکات بەسەرکردە یان کەسێکی ناودارو یەکشەو لەلای دەبێت ، ئەگەر لەعەورەتی خۆرهەڵهات زینادەکات.

*ئەگەر بینی دوای ڕۆژ دەکەوێتو ئەویش دەڕوات بەڵام ئاوانەبوو لەگەڵ سەرکردەیەکدا دیلدەکرێ.

*ئەگەر بینی ڕۆژ بوە بەپیاوێکی پشتچەماوە دەستەڵاتدار لەبەرخوا خۆی بەکەمدەزانێو دادپەوەردەبێو هێزو توانا بەدەستدەهێنێو حاڵوباری موسوڵمانان باشدەبێ، ئەگەر بوو بەلاوێك حاڵی موسوڵمانان لاوازدەبێو دەستەڵاتدار ستەمدەکات.

*ئەگەر ئاگرێکی بینی لەڕۆژهاتە دەرەوەو دەوروبەری خۆی سووتاند سەرکردەو فەرمانڕەوا دەوروبەرەکەی تیادەبات.

*ئەگەر بینی ڕۆژ سوورهەڵگەڕاوە خراپە ڕوو لەشوێنی نیشتەجێبوونی دەکات، ئەگەر بەزەردی بینی فەرمانڕەوا نەخۆشدەکەوێ، ئەگەر ڕەشبوو زاڵدەبێو بەڵاو نەهامەتی لەسەر کۆدەبێتەوە.

*ئەگەر بینی خۆر ئاوابوو داواکەی لێوندەبێت.

*بەربەرەکانی خۆر دەرچوونە لەپادشاو فەرمانڕەوا، کەمبوونەوەی تیشکیخۆر دابەزینی هەیبەتی فەرمانڕەواو دەستەڵاتدارە.

*ئەگەر بینی خۆر بوە بەدووبەشەوە بەشێکی بمێنێتەوەو بەشێکی بڕوات خەڵکی یاخیدەبن لەفەرمانڕەوا ، ئەگەر ئەوکەرتەی مابوەوە شوێنی ئەوکەرتەکەوت کەتیاچوبوو ئنجا بوونەوەبەیەك ڕۆژێکی دروست پەدابوەوە دەوری وڵاتدەدات.

*ئەگەر خۆری بینی کەوتەخوارەوە بەڵاو نەهامەتییە ڕوو لەبەرپرسی زەوی یان باوكو دایکیدەکات.

*ئەگەر بینی خۆرهەڵهات لەماڵێکداو ماڵەکەی ڕۆشنکردەوە سەرنشینانی ئەو ماڵە مەزنیو شکۆو ڕزقو ڕۆزی بەدەستدەهێنن.

*ئەگەر بینی خۆری قووتدا ژنێکی مەینەتاوی پڕ خەمو پەژارە بەسەردەبات.

*ئەگەر فەرمانڕەواو بەرپرسێك خەوێکی لەوچەشنەیان بینی دەمرێت.

*ئەگــەر پریــشكێ لەتیــشكیخۆر وەربگرێ خوداوەند گەنجینەو ماڵێكی مەزنی پێدەدات.

*ئەگــەر بینــی خۆردابەزییــە سەرجێگەكەی نەخۆشدەكەوێو لەش‌و لاری گڕدەگرێ.

*ئەگــەر بینــی خەریكــە چــاكەی لەگەڵدەكرێ بەڵگەیە لەسەر فەڕوپیت.

*بــۆ زۆر كــەس بەڵگەیــە لەســەر لەشــساغی ، ئەگــەر تیــشكی خــۆر شتێكی لێببات یان پێیبدات باش نییە.

*لەبەڵگەكانی خێـر ئەوەیـە مـرۆڤ رۆژ لەســەر شــێوەی خــۆی ببینــێ، دەگونجێت زیادو كەمی زیانبەخشبێت.

*ئەگــەر هەســتی بــەتین‌و گــەرمای خــۆركردو روویكــردە ســێبەر لەخــەم‌و پەژارە قوتاردەبێ.

*ئەگەر سەرمایبوو لەسێبەرداو چوە بەرتیشكیخۆر هـەژاری بەسەردەچێت، چــونكە ســەرما هەژارییــە، ئــەوەی زاڵببێــت بەســەر خــۆرداو رەش‌و چــەتوونبێ فــەرمانڕەواو ســەرۆك ناچاریدەكات لەكاروبارێكدا.

*دەگێڕنەوە دادوەری (حمص)لەخەودا بینــی رۆژومــانگ بەجەنگــدێن لەگــەڵ یەكــدی، هەســارەكان پــەرت‌و بــەش بەشدەبن، بەشێكی لەگەڵ رۆژدادەبن‌و بەشێكی لەگەڵ مانگ، خەوەكەی بۆ (عومــەر)ی كــوڕی(خــەتتاب)(رەزای خوای لێبێت)باسكردو ئەویش پێی وت: تۆ لەگەڵ كامیانبووی؟ وتـی: لەگەڵ مانگ (عومەر) ئایەتی: ﴿ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً ﴾ (الإسراء: ١٢)ی خوێندەوە.

ئنجـا لەســەركار لــە(حمــص)لایــبرد، فراســەتی (عومــەر) بــۆ ئــەو خــەوە گونجــاوبوو ئــەو پیــاوە لەگــەڵ (معاویە)بوو لەرۆژگاری (صفین)دا.

*ئەگــەر بینــی (رۆژ)و (مــانگ)و (ئەســتێرەكان) لەیــەك شــوێندا كۆبونەوەو بوو بەخاوەنیان‌و رووناكی‌و تیــشكداربوو قــسەو گوتــەكانی لای فــەرمانڕەواو وەزیــرو ســەرۆكەكان وەردەگیرێ، ئەگەر نورو رووناكی نەبوو خەوبینەر هیچ خێرێكی نییە.

*ئەگـەر هەریـەك لـە(رۆژ)و (مـانگ)ی بینی دەركـەوتوون بـۆی دایك‌و بـاوكی رازیـین لێـی، ئەگـەر تیشك‌و روونـاكی نەبوو لێی ناڕازین.

*ئەگـەر لـەلای راسـت‌و چـەپ‌و قـاچ‌و پێــشەوەی رۆژو مــانگی بینــی غــەم‌و پــەژارە رووی تێــدەكات لەگــەڵ ترس‌وبیم‌و بەلاو نەهامـەتی‌و دۆڕاندن‌و ناچـار دەبـێ هـەڵبێت بـەپێی ئایـەتی: ﴿وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ ، يَقُولُ

الإنسان يومئذٍ أين المفر﴾ (القيامة:٩ـ١٠).

*رەشی ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانو لێڵبیان گۆڕانی نیعمەتەکانە لەدنیادا، ڕۆژگێران ڕووداوێکە دێت بەسەر فەرمانڕەوایەکدا.

*ئەگەر تەمو مژێکی بینی تیشکی خۆریگرتو ڕووناکی نەهێشت فەرمانڕەوایەك نەخۆشدەکەوێ، ئەگەر بینی نەدەجوولا لەنێو هەورەکەداو نەدەهاتە دەرەوە لێی فەرمانڕەوایەك دەمرێ، دەگونجێت تیشکی خۆر زانایەك بێت ئەگەر تەمو مژەکە ڕەوییەوە غەمو پەژارە دەڕەوێتەوە.

(نابلسی) دەڵێت: ڕۆژ لەخەودا فەرمانڕەوایەکی مەزنە یان بەرپرسە یاخود باوکە یان زێڕ یاخود فەرمانڕوایەکە یان ژنێکی شۆخو شەنگە.

*ئەگەر ڕۆژی لەخولگەی جیاوازدا بەدیکرد بەڵگەیە لەسەر یاخیبوونی خەڵکی لەفەرمانڕوا لەهەموو شوێنو جێگەیەك، هەروەها ئەگە ڕۆژو مانگ گفتوگۆیان لەگەڵکردو لەگەڵیان ڕۆیی دەمرێت.

*ئەگەر ڕۆژی لەشوێنێکدا بینی بەدەر لەشوێنێکیترو خاوەنی جەنگبوو ڕێنومایدەر دەبێت لەجەنگدا، وەگەرنا شارەزاییەکە بەدەستیدەهێنێت.

*ئەگەر ڕۆژی بینیو تیشکی نەبوو لەشانو شەوکەتی فەرمانڕەوا کەمدەبێتەوە بەئەندازەی کەمبوونەوەی تیشکی خۆر، ئەگەر بینی تیشکەکەی ناکەوێتەسەری ئەگەر دەستەڵاتداربوو شانو شەوکەتی پادشا دادەبەزێ، ئەگەر سەرکردەبوو شکۆمەندی بەسەردەچێت، ئەگەر فەرمانڕەواو کاربەدەستبوو لەسەرکارەکەی لادەبرێ، ئەگەر کەسێکی ئاسایبوو بژێویەکەی تیادەچێت، ئەگەر ژنبێت دەیهێنێتو خەرجی ناکێشێ.

*ئەگەر ڕۆژی بینی تەماشای ڕووناکیەکەی دەکرد دەستەڵات بەدەستدەهێنێت، ئەگەر شیاوو گونجاوبێت یان دەمڕاستی گەڕەكو گوزەری خۆیان بێت.

*ئەگەر ڕۆژی بەڕووناکیو درەوشاوەیی بینی لەوڵاتی خۆیدا ئەگەر لەسەفەردابوو بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمانی خۆی.

*ئەگەر بینی ڕۆژ لەڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێت بەتیشکێکی ڕووناكو بێگەردو بەهەمان شێوەش ئاوادەبوو بەڵگەیە

لەسەر خێر بۆخەڵکی ئەو شارەو لەژێر دەستی ئەو فەرمانڕەوایەدا ژینێکی خۆشنوود بەدەستدەهێنن.

*ئەگەر ڕۆژی بینی هەڵهات لەرۆژئاواوە خەوبینەر ئابڕووی دەچێت لەنێو خەڵکیدا، ئەگەر لەنێوان خۆیو کەسێکیتردا نهێنیی هەبوو ئاشکرایدەکات ، دەگونجێت ڕووداوێکی پەنهان ئاشکرا ببێ.

*ئەگەر بینی ڕۆژ گۆڕاوە لەحاڵوباری خۆی فیتنەو ئاشوب لەنێو ئەو شارەدا ڕوودەدات.

*ئەگەر بینی لەبەر تیشکی خۆردا دانیشتوە نازو نیعمەتێکی فراوانی دەستگیردەبێت لەگەڵ فەڕوبەرەکەت لەئاسمانەوە دادەبەزێ بەسەریا.

*ئەگەر تیشکی خۆری بەدەستهێنا گەنجینەیەکو ماڵو سامانێکی مەزن بەدەستدەهێنێتو خوداوەند خێرێکی مەزنی پێدەدات.

*ئەگەر مرۆڤ بینی خۆر لەرۆژهەڵاتەوە هەڵدێتو لەرۆژئاواوە ئاوادەبێت بەڵگەی خێرە بۆ هەموو خەڵکیو بەڵگەیە لەسەر کردارەکان چونکە لەخەو بەئاگایان دەهێنێتو بێداریاندەکاتەوە بۆ کردارەکانیان.

*بۆهەندێك کەس بەڵگەیە لەسەرئەوەی منداڵی نێرینەی دەبێتو، بۆسەرجەم خەڵکی بەڵگەی خۆشییەو بۆئەوەشی دەیەوێت کاروبارەکانی بشارێتەوە بەڵگەیە لەسەردەرخستنیو هەمووشتەکان دەردەخات.

*ئەگەر بینی لەرۆژئاواوە هەڵدێت بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی شتەپەنهانو نادیارەکان، ئەگەرچی خاوەنەکەی سووربێت لەسەر پەنهانو شادرنەوەی، ئەگەر نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی، ئەگەر تووشی چاوئێشەبوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی چاوەکانی کوێرنابێت، ئەوەی لەسەر سەفەربێت بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی لەسەفەر.

*هەروەها بەڵگەی خێرە بۆیەکێك بیەوێت سەفەر بکات بۆ لای ڕۆژئاوا.

*هەروەها ئەگەر بینی ڕۆژ لەرۆژئاواوە هەڵدێت ڕووبەرۆژهەڵات هەر بەو چەشنەیە.

*هەروەها ئەگەر بەتاریکی ڕۆژی بینیو ڕەنگی خوێنی گرتبوو یان لەشێوەیەکی جیاوازدا بەدیکرد بەڵگەو نیشانەی خراپە بۆ سەرجەم خەڵکیو بۆ هەندێك بەڵگەیە لەسەر نەخۆشکەوتنی کوڕی خەوبینەر یان

ناڕەحەتیـــەك دێـت بەســـەریا، یـــان ئێش‌وئـــازار روو لەچـاویدەكات، بـــەڵام بۆیـــەكێك خوازیـــاری شـــاردنەوەی كاروبارەكانی بێت بەڵگەیەكی گونجـاوو شیاوە بۆی.

*ئەگـــەر بینـــی رۆژ نـــەماوەو پارچـــە پارچـــە بـــوە بەڵگەیـــەكی خێرایـــە بۆسەرجەم خەڵكی، مەگەر بۆ كەسانێك نـەبێت بـەنهێنی كاردەكـەن‌و زۆرجـار بەڵگەیـە لەسـەر كـوێری یـان مـەرگی كوڕانی خەوبینەر.

*ئەگـــەر چـــەن خـــۆرێكی بینـــی لـەخۆیگرتبوو بەڵگـەی خێـرە ئەگـەر لەســـەفەردابوو، بـــەڵام بۆنـــەخۆش بەڵگەی ناڕەحەتی‌و مەرگە.

*ئەگـەر بینـی رۆژ شـتێكی دەداتـی‌و شـتێكی تـری لێـوەردەگرێ باشـنییە، ئەگەر پێیدا بەڵگەیە لەسەر ناڕەحەتی‌و بردن لەگەڵ تیاچوون‌و فەوتان.

*ئەگـەر بینـی خـۆر نـورو روونـاكی لێـــوەگرت هاوەڵایـــەتی فـــەرمانڕەوا دەكات‌و خەڵاتیدەكات.

*گـەرماو تینـی خـۆر ئەگـەر لەسـنوور دەرچوو بەدەستیهێنا غـەم‌و پـەژارەی لەدەستەڵاتدارەوە دەستدەكەوێ.

*ئەگەر بینی لەخۆرهەڵدێت لەگـەورەو دەستەڵاتدار یاخود خراپەیەك هەڵدێت.

*ئەگـەر بینـی رۆژ لەعـەورەتی هاتـە دەرەوە كـــوڕێكی دەبێـــت دەبـــێ بەفەرمانڕەوا یان وەزیر.

*ئەگـەر بینـی رۆژو مـانگ كۆبوونـەوە لـەلای بەتیـشك‌و روناكییـەوە بەڵگەیـە لەسـەر هاوسـەرگیری لەگـەڵ ژنێكـی جواندا.

*هـەڵهاتنی رۆژ لـەرۆژئاواوە بەڵگەیـە لەسـەر فـەرمانڕەوایان‌و ئابڕووچـوون‌و گوتراویـشە بەڵگەیـە لەسـەر تەوبـەو پەشـیمانی یـان نزكیبوونـەوەی وادەو چارەنووسی یان رووداوێك لەسەر زەوی روودەدات.

*بۆنـــەخۆش بەڵگەیـــە لەســـەر تەندروستی‌و لەشساغی.

*ئەگەر بینی هەورەكە ئاوابوو بەڵگەیە لەسـەر رەواندنـەوەی غـەم‌و پـەژارەو نەخۆشی‌و لاچوونی موڵك‌و دەستەڵات.

*ئەگـەر بینـی لـەژێر تیـشكی خـۆردا نەبێت نـاڕوات سـەفەر دەكـات‌و ئەگـەر هەڵهات لەسەر نەبوونی‌و سووتان.

*ئەگـــەر دە رۆژی بینـــی هـــەڵیگرت‌و لەپەڕۆیەكـدا دایـنـا دە هـەزار درهـەم بەدەستدەهێنێت.

*دەگونجێـــت خـــۆر زانایـــەكبێت‌و رێنومایی پێوەربگرێ.

*گیرانی ڕۆژ بەهەور بەڵگەیە لەسەر لابردنی فەرمانڕەوا بەهۆی ستەمەوە لەژێردەستەکانی کردوە.
*ئەگەر سەرمای بەدیکرد لەسێبەرداو چوە ژێر تیشکی خۆر هەژاری بەسەردەچێت چونکە سەرما هەژارییە.
*ئەگەر زاڵبوو بەسەر ڕۆژداو ڕەشداگیرسابوو فەرمانڕەوا لەکارێك لەکارەکاندا ئیشی پێی دەبێت.
*ئەگەر ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانی بینی لەیەك شوێندا کۆبوبوونەوەو بوو بەخاوەنیانو خۆرو ڕووناکی هەبوو وتەکانی پەسەند دەکرێن لەلای فەرمانڕەواو وەزیرو سەرکردەکان، خۆئەگەر ڕووناکی نەبوو خەوبینەر هیچ خێرێکی تێدا نییە.
*ئەگەر ڕۆژو مانگی بینی هەڵهاتبوو دایكو باوکی ڕازین لێی، ئەگەر ڕووناکیان نەبوو تورەدەبن لێی.
*ئەگەر ڕۆژو مانگی بینی لەلای ڕاستو چەپیو قاچیو پشتییەوە غەمو پەژارە یان بەلاو نەهامەتی یاخود دۆڕان ڕووی تێدەکاتو ناچاریدەکات بۆ هەڵهاتن.
*ڕەشداگیرسانی ڕۆژو مانگو ئەستێرەو لێڵبوونیان گۆڕانی دنیایە.

*ئەگەر دووڕۆژی بینی کێشایان بەیەکدا دووفەرمانڕەوا دەجەنگن لەگەڵ یەکدا.
*ئەگەر بینی کڕنووشدەبا بۆڕۆژو مانگ گوناهێکی گەورە ئەنجامدەدات.
*ئەگەر تیشکی خۆری بینی لێوەی هاتەدەرەوە دەستەڵاتو پلەوپایە بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر ڕۆژی بینی لەگەڵ هەسارەکانی دیکەدا زاڵدەبن بەسەر هەسارەی تردا کەلەپێشەوەن، دوژمنانی دەبەزێنیٚو هێزو توانای لەوان زیاتر دەبیٚو بەختی دەکرێتەوە.
*دەگونجێت بینینی ڕۆژ بەڵگەبێت لەسەر ڕزقو ڕۆزیو بژێویو ڕێنومایيو شوێنکەوتنی ڕاستیو پۆشاكو جلوبەرگی بەنرخو چاکبوونەوە لەنەخۆشی بۆیەکێك دابنیشیٚ لەبەریا یاخود ببێت بەخاوەنی لەوەرزی زستاندا.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو هەژاریو نەخۆشی بۆ یەکێك ببێت بەخاوەنی یان لەوەرزی هاویندا لەژێریدا دابنیشیٚ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەرو هەڵهاتن یان ئاوابوونیو بینینی لەشوێنێکدا ڕێزو پایەداریو شکۆمەندییە.

*بینینـــی لەشـــوێنی نیـــشتنەوەیدا بەڵگەیە لەسەر هەژاریو زەرەرو غـەمو پەژارەو بۆڵە.

*زۆربـوونی خـۆر بیدعـەو تـرسو بـیمو دابەزینی رزقو رۆزیو بژێویە، هەروەها زۆری مانگەکانیش بەڵگەیە لەسـەر ئـەو ئاژەڵەی بەلەسەیەو نایـەڵێ بـۆ سـواری بەکاربهێنرێ.

*هەروەها چەن رۆژێك بەڵگەیـە لەسـەر ئەوانەی ناوەیان هەڵگرتوە.

*ئەگـــەر خۆرەکـــان زۆربــــوونو رووخـــسارەکان رووناکنەبوونـــەوە کۆمـــەڵێ رێکـــەوتوون لەســـــەر بەرژەوەندی.

*ئەگەر تیشكو رووناکی زیادیکرد هەتا چاوەکان پێی گەشبوون مەبەست زۆر دەبێو بەرژەوەندی تیادەچێت.

*ئەگەر رۆژ خواردی سوود لەخزمـەتو ریکخستنی وەردەگرێو لـەوەوە مـاڵو دارایـــەکی زۆری دەســـتدەکەوێ، دەگونجێت ببێـت بەئەسـتێرەوان یـان پەروەرشـیار یـاخود زانایـەك بـەهۆی رۆشتنی رۆژەوە.

*ئەگـــەر رۆژ ســـووتاندی بەتایبـــەت لەخۆشەویـستی کەسـێکدا تیادەچـێت یـان بەڵایـەك رووی تێـدەکات لەلایـەن کەسـێکەوە خـۆر بەڵگەیـە لەسـەری، دەگونجێـت ئـەوە بەڵگـەبێت لەسـەر خراپی بۆچوونی یاخود لەسـەر ئـەوەی سەرپێچیدەکات.

*هـــەڵگرتنی رۆژ لەلایـــەن ژنێکـــەوە هاوســـەرە یـــان کـــورێکی جوانکیلەیـە پێیدەبەخشرێ.

*ئەگـــەر رۆژ دوا لەگـــەڵی زانیـــاری ئامـادەبوونی جنۆکـە فێردەبـێو نامـە دەنووسێ بۆ گەورە پیاوان یان دەبێـت بەوەرگێر.

*بینینـــی رۆژو مـــانگو ئەســـتێرەکان بەڵگەیـە لەسـەر بـەڵاو نەهامـەتی یـان زینـدانیو ئیرەیـی خانـەوادەو خـزم، پاشان دەرەنجامەکەی رووبەدەستەڵات یـان لەشـساغی لەئاینـدا دوایـی دێـت بەپێی چیرۆکی (یونس) (سەلامی خوای لێبێت).

*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـــەر ترسوبیمو ناڕەحەتی.

*بینینـی خـۆر بەڵگەیـە لەسـەر چـرا بـەپێی ئایـەتی: ﴿وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجاً﴾ (نوح: ١٦).

*هـەڵهاتنی رۆژ لـەرۆژئاواوە بەڵگەیـە لەســـەر تـــرسو بـــیمو راچـــەڵەکانو زاڵبوونی دەستەڵاتدار بەسەر خەڵکیداو گەڕانەوە لەدوژمن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گەڕانەوەی کەسێك لەسەفەردا کەبەغەم و پەژارەو بەلاوە سەفەریکردبوو، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پاشگەزبوونەوە لەئاین و خراپی تەوبەکاران و بڕواهێنان بەزۆر.

*ئەگەر بینی ڕۆژ کشتوکاڵ و بێستان دەسوتێنێ یان زیان بەخەڵکی دەگەیەنێت بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی و بەلاو نەهامەتی یان زوڵم و ستەمی گەورەو بەرزبوونەوەی نرخی خواردن، ئەگەر لەئاسماندا چەند ڕۆژێك هەبوو زەرەر بەخەڵکیدەگەیەنێت لەگەڵ گەلێکی ستەمکارو شەڕەنگێز ، ئەگەر خەڵکی سوودی لەتیشکی خۆر وەرگرت دادوەریی و سوودمەندیو بازرگانییە، دەگونجێت لەکشتوکاڵدا بەروبووم و ئەوەبێت کەپێویستی بەتیشکی خۆر هەیە.

**ڕۆژگیران و مانگگیران:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا ڕۆژگیرا ڕووداوێك ڕوو دەکاتە پادشاو فەرمانڕەوای باڵای وڵات.

*ئەگەر مانگی بینی گیرا ڕووداوێکە دێت بەسەر وەزیرەکانی وڵاتدا.

*هەروەها دەڵێن: ڕۆژگیران مەرگی ژن یان دایکە.

*ئەگەر هەوری بینی تیشکی ڕۆژی داپۆشی فەرمانڕەوا نەخۆشدەکەوێ، ئەگەر بینی جوولایەوە بەلام لەنێو گەواڵە هەورەکە دەرنەچوو دەمرێ.

*دەگونجێت ڕۆژ زانایەك بێت.

*ئەگەر تیشکی خۆری بینی گەواڵەهەور داپۆشیوە فەرمانڕەوای ئەوشارە دەکەوێ و بەهۆی ستەم و زۆردارییەوە دەستەلات لەدەستدەدات.

**ڕۆژوو:** (ئەبوسەعد) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ڕاڤەکارانی خەو جیاوازی هەیە لەنێویاندا لەلێکدانەوەیان بۆ ڕۆژوو هەندێکیاندەڵێن: ئەگەر بینی لەمانگی ڕەمەزاندایە خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر بەرزبوونەوەی نرخ و نەبوونی خۆراك.

*هەندێکبدی دەڵێن: ئەم خەونە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئاینی خەوبینەرو قوتاربوون لەغەم و پەژارەو چاکبوونەوە لەنەخۆشی و دانەوەی قەرز.

*ئەگەر بینی مانگی (ڕەمەزان) بەڕۆژبوو هەتا ڕۆژوو شکاندن ئەگەر گوماندرابوو دڵنیادەبێت بەپێی ئایەتی:

﴿ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ ﴾ (البقرة:١٨٥).

*ئەگەر خەوبینەر نەخوێندەواربوو قورئان لەبەردەکات.

*ئەگەر بینی لەمانگی (ڕەمەزان)دا بەدەستی ئەنقەست بەڕۆژو نەبوو نکوولی لێکرد سووکایەتی بەهەندێك لەیاساو شەریعەتەکاندەکات.

*ئەگەر بینی دانی پێداناو خوازیاربوو بیگرێتەوە رزق و ڕۆزیەك ڕووی تێدەکات بەخێرایی بەبێ ئەوەی سەرچاوەکەی بزانێت.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر بینی لەمانگی (ڕەمەزان)دا ڕۆژووی شکاند پاکیو فیترەتی پێکاوە، هەندێکیتر دەڵێن: ئەوکەسە لە بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار سەفەردەکات بەپێی ئایەتی: ﴿ فمن كان منكم مريضا أو على سفر ﴾ (البقرة: ١٨٤).

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی لەمانگی (ڕەمەزان)دا بەدەستی ئەنقەست بەڕۆژو نەبوو پیاوێك بەبێ هۆ دەکوژێت.

*ئەگەر بینی باوەڕدارێکی بەدەستی ئەنقەست کوشت لەمانگی (ڕەمەزان)دا بەبێ هۆ ڕۆژو دەشکێنێ.

*ئەگەر بینی دوومانگ بەدووی یەکدا بەڕۆژوبوو لەبری گوناهێك تەوبەدەکات لەگوناهێك ئەنجامیداوە.

*ئەگەر بینی ڕۆژووی مانگی (ڕەمەزان) دەگێڕێتەوە دوای ڕابواردنی مانگەکە نەخۆشدەکەوێ.

*ئەگەر خۆبەخشانە بەڕۆژوبوو لەوساڵەدا نەخۆش ناکەوێت بەپێی ئەو وتەیەی دەڵێت: "بەڕۆژوبن بۆئەوەی لەشساغ بن".

*ئەگەر بینی سەراپای مانگ بەڕۆژوبوو لەگوناه خۆیدەپارێزێ.

*ئەگەر بینی بەڕۆژوە بۆ ڕوپامایی و ناوبانگ بەدەر لەپەروەردگار غەیبەتی مەردومێکدەکات یاخود نەخۆشییەکی سەختوگران دەگرێ.

*ئەگەر بینی بەڕۆژوەو نازانێت ڕۆژووی فەرزە یان سوننەت گێڕانەوەی نەزرێك لەئەستۆیدایە بەپێی ئایەتی: ﴿ اني نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْماً فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنْسِيًّا ﴾ (مريم:٢٦).

*دەگونجێت بەردەوام بێدەنگبێت چونکە ڕۆژو لەبنەڕەتدا بێدەنگییە.

*ئەگەر بینی لەڕۆژی جەژندایە لەغەم و پەژارە قوتاردەبێ و دیسان خۆشی و شادی بۆ دەگەڕێتەوە.

*ئەگەر بینی بەڕۆژوە یاخود دەمی هەڵبەستوە خۆی لەگوناه دەگرێتەوە.

(نابلــسی) دەڵێــت: رۆژو لەخـــەودا بەڵگەیە لەسەر نـەزرو نـەزریش لەسـەر رۆژوو، ئەگـــەر رۆژوەوانێکـــی بینـــی رۆژوەکەی شکاند نەخۆشـدەکەوێ یان سەفەردەکات.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی لەخەودا رۆژو بشکێنێ غەیبەتی موسوڵمانێکدەکات.

*ئەگەر بینی لەبیریچوو رۆژووی شکاند رزق و رۆزییەکی باشی پێدەدرێ.

*ئەگـەر بینـی بـەرۆژوە شـکۆمەندیو تەوبـــە بەدەســـتدەهێنێ یـــاخود کەفارەتێك(لـەبری)سوێندەکەیدەداتو (حەج)دەکات.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی بەرۆژوە کـورێکی نێرینـــەی دەبێـت، ئەگـــەر نەخوێندەواربوو قورئـان لەبـەردەکاتو مــژدەو خێرێکـــی مـــەزنی دەســـتگیر دەبێت.

*ئەگەر بینی لەمانگی (رەمەزان)دایەو بەتـەنیا هـەر خـۆی بـەرۆژوە یـاخود لەگـەڵ خەڵکیـدا پیـاوێکی بـاوەڕداری باشـەو ئـاینو چـاکەو دنیانەویـستی تێدایـە، ئەگـەر پـەژارەدارێك خـەوێکی لەوچەشـــنەی دی خوداوەنـــد دەرووی خێری لێدەکاتـەوە، ئەگـەر نەخۆشـبوو پـەروەردگار چارەسـەریدەدات، ئەگـەر وێـڵ و سـەرگەدانبوو رێنومایـدەکرێ، ئەگەر قەزاربوو قەرزەکەیدەداتەوە.

*ئەگـەر بینـی لـەمانگی (رەمـەزان)دا رۆژووی شـکاند بەدەسـتی ئەنقەسـت بەنارەحـــەتی مرۆڤێـــك دەکوژرێـــت هەروەها بەپێچەوانەشەوە.

*ئەگەر بینـی دوومـانگ بـەرۆژوبوو بـۆ کـەفارەتێك یـاخود گێڕانـەوەی مـانگی (رەمـــەزان) نەخۆشـــدەکەوێو تەوبـــە دەکات.

*ئەگـەر بینـی وازی لـەرۆژوی مـانگی (رەمـەزان) هێنـا لەخۆیـەوە یا نکوولی لەیـــەکێك لەیاســـاکانی شـــەریعەتی ئیـــسلامدەکات ، ئەگـــەردانی پێـــداناو ویـستی رۆژوەکـە بگێڕێتـەوە رزقێکـی باشـــە لەلایەکـــەوە خـــۆی نایزانێـــت بۆیدێت.

*ئەگـەر بینـــی لـەمانگی (رەمـەزان)دا رۆژوی شـــکاندوە لەســـەر پـــاکیو سروشـــتی چـــاکەیە ، دەگونجێـــت ســـەفەرێك ئەنجامبـــدات لەگوێڕایـــەڵی پەروەردگاردا.

*رۆژوی نادیـــار لەخـــەودا قـــەڵغانو پارێزەرە لەدوژمنو زیان.

*دەگونجێت رۆژو بەڵگەبێت لەسەر:

+مردنی نەخۆش.

+بێدەنگی.

+خۆشیو شادی.
+دڵسۆزی بۆ خوداوەند لەوتەو کرداردا.
*ڕۆژووی خەڵکی لەخەودا بێهیچ شتێك بەڵگەیە لەسەر نەبوونیو سەختی بژێویو ژیان.
*ئەگەر خەوبینەر نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی.
*ئەگەر ڕۆژوانی (ڕەمەزان) خواردنی خوارد لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەنجامدانی کاری حەرامو یاساغ یاخود قەرزاری یا نەخۆشییە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چاکبوونەوەی لەوەسوەسەی شەیتان یاخود بەڵگەبێت لەسەر بژاردنەوەی قەرزو تەوبەی خراپەکاران.
*گرتنی ڕۆژووی شەش ڕۆژی مانگی(شەوال) بەڵگەیە لەسەر ناسکیو چێژداری نوێژ یاخود زەکاتدان یا پەشیمانی لەکارێك لەدەستیدەرچوە.
*ڕۆژووی دووشەممە خزمایەتیو پێنج شەممە:
+بەڵگەیە لەسەر پاراستنی پەیوەندی خزمایەتیو بەسەرکردنەوەیان بەچەشنێ ڕازیبن.

+ئامادەبوونو کۆبوونەوە لەکۆڕی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەوانەی گونجاوە لەڕووی شەرعەوە لەگەڵیاندا کۆببێتەوە.
*ڕۆژووی (١٣ـ ١٤ـ ١٥)ی هەموو مانگێکی عەرەبی: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەشبەش قەرزدانەوە یان قورئانو زانیاری وتن بەخەڵکی.
*ڕۆژووی (١٠) ڕۆژی مانگی (محرم): لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خواناسیو (حەج)و خۆپارێزی.
*ڕۆژووی ڕۆژی (عرفە) وەستانی عەرەف لە(حەج): بەڵگەیە لەسەر پەسەندکردنی خێروچاکە.
*ڕۆژووی (١٠) ڕۆژ مانگی (ذی الحجە): لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەکۆتایی تەمەندا بەباشی کۆتایی دێتو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەجێهێنانی ئەو پەیمانەی داویەتی.
*ڕۆژووی (عاشورا): لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەنجامدانی کاری خێرو بینینیو پارێزگاری لێیو ئامادەبوون لەبۆنەی (حەج)دا کەبەبۆنەیەکی ساڵانە دادەنرێ. ئەگەر هاوسەرەکەی دووگیانبوو کوڕێکی ساڵحی دەبێتو ماڵێکی حەلاڵی دەستگیردەبێ.

*ڕۆژووی مانگی (رجب): بەڵگەیە لەسەر خزمەتکردن بەپلەوپایەداران، دەگونجێت داوایەکی هەبێت لەدەریاوە پێی بگات یان لەدەریاوە سەفەر بکات.

*ڕۆژووی مانگی (شەعبان): لەخەودا بەڵگەیە لەسەر چاوپێکەوتنی ئەوانەی بەسواریهاتوون بۆ بازاڕ چونکە رزق و رۆزییان یەکانگیر بووەو سوودو قازانجدەکەن.

*ڕۆژووی ئەو رۆژەی گومانی تێدایە(یوم الشك): لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەنجامدانی گوناهو تاوان و سەرپێچی.

*گێڕانەوەی ڕۆژووی لەکیسچوو: بەڵگەیە لەسەر ئازادبوونی دیل و تەوبەی سەرپێچیکارو قەرزدانەوە.

*ڕۆژووی (نەزر) لەسەرخۆ پێویستکردن: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی پێداویستی و خۆشی وشادی.

*ڕۆژووی بەردەوام: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوننەتێکی قورس وگرانی بەجێگەیاندووەو بیدعەیەکی دیاری هێناوە، دەگونجێت زۆر بێدەنگ بێت و قسەنەکات بەچاکە نەبێت ئەمەش لەکاتێکدا ئەگەر ڕۆژێك بەڕۆژوبوو ڕۆژێکیش بەڕۆژونەبوو، یاخود دەگونجێت دووهاوسەری هەبێت یەکێکیان موسوڵمان و ئەوی دی ناموسوڵمان.

*ئەنجامدانی ئەوکارانەی ڕۆژو تێکدەدات لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شکانی پەیمان و خۆشەویستی دنیا بەسەر قیامەتداو کەوتنە نێو کارێکەوە مەردوم ناچاری کەفارەت بکات لەسوێند یا هەرشتێکیتر.

*شکانی ڕۆژوو دوای بەڕۆژوبوون بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی نەخۆش و هاتنی خۆشی و شادی.

*ئەگەر لەخەودا بینی لەمانگی (ڕەمەزان)دایە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر:

+گرانی و بەرزبوونەوەی نرخی شتومەك.

+پاکی و دروستی ئاینی خەوبینەر.

+دەرچوون لەغەم و پەژارەو چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

+قەرزدانەوە.

*ئەگەر بینی ڕۆژوی (ڕەمەزان) دەگێڕێتەوە نەخۆشدەکەوێ.

*ئەگەر خۆبەخشانە (تطوع) بەڕۆژوبوو لەوساڵەدا نەخۆشدەکەوێ.

*ئەگەر بینی بەڕۆژوە بۆ ڕوپامایی و ناوبانگ ناگات بەداواخوازی خۆی.

**رۆم:** (نابلسی) دەڵێت: هەستکردنە بەوەی خوازیارە لێی دووربکەوێتەوە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەرکەوتن‌و ملکەچی، پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿ الم ، غُلِبَتِ الرُّومُ ، فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ، فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ ] (الروم: ١ ـ ٤).

**رۆن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: رزقێکە لەسەفەردا بەمەردوم دەگات یاخودماڵێکی حەرامەو مامەڵەکردنە لەگەڵ گەل‌و نەتەوەیەکی بێپارەدا.

*هەروەها دەڵێن: رۆنخۆر داوای چاکە دەکات لەیەکێك خێرو چاکەی تێدا نییە.

(نابلسی) لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زانیاریەکی بەسوود لەگەڵ یەکتاپەرستیەکی بێگەردو بەدوور لەگومان.

*ئەو ژنەی بەزۆر رۆن هەڵدەگریٚ‌و گونجاو نییە هەڵیبگریٚ بەناچاری زینادەکات.

*ئەگەر لەدەفرێکدا رۆنی هەڵگرت بەڵگەیە لەسەر :

+زانیاری‌و فیقەو قورئان بۆ خانەوادەکەی.

+چارەسەر.

+ماڵ‌و سامان‌و سوودو داواخوازی ماڵ‌و سامان.

+پیت‌و فەڕ بۆ یەکێك لەناڕەحەتیدا بێت.

+تەندروستی ساغ بۆیەکێك نەخۆشبێت ئەگەر خواردی.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: رۆن ماڵ‌و سامانی زیادەیە، ئەگەر بینی قەڵەوبوە ماڵ‌و سامانەکەی زیاد دەکات.

*هەروەها دەڵێت: خۆ چەورکردن بەرۆنی باش پیاهەڵدانی چاکە، خۆچەورکردن بەڕۆنی بۆگەن‌و خراپ پیاهەڵدانی خراپ‌و ناقۆڵایە.

*هەروەها دەڵێن: رۆن لەبنەڕەتدا غەم‌و پەژارەیە.

*ئەگەر دەبەیەك رۆنی بینی‌و رۆنی لێدەرهێناو خۆی یا کەسێکیتری پێچەورکرد مەراییدەکات یاخود سوێند بەدرۆ دەخوات یاخود قسەهێنەرو قسەبەرە بەپێی ئایەتی ﴿ودوا لو تدهن فيدهنون﴾(القلم: ٩).

*ئەگەر بینی سەری خۆی چەورکرد غەم‌و پەژارە دایدەگریٚ ئەگەر لەئەندازەی خۆی دەرچوو بەرووخساریدا هاتەخوارەوە، ئەگەر

لەئەندازەی خۆی دەرنەچوو جوانیو رازاوەییە.
*رۆنی چاکو بۆنخۆش پیاهەڵدانی باشە.
*رۆنی بۆگەنو خراپیش پیاهەڵدانی خراپە.
*هەروەها دەڵێن: رۆنی بۆگەن ژنێکی زیناکارە یاخود پیاوێکی خراپو بەدە.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر سەری پیاوێك چەور بکات لەشوێنو جێگەیەك کەئەو پیاوە رقی لێی بێت با ئاگاداری ئەو کارەبێت کەلەگەڵیدا ئەنجامدەدرێت.
*ئەگەر رووخساری خۆی بینی چەورکراوە پیاوێکە بەدرێژایی ساڵ بەرۆژو دەبێت.
*ئەگەر بینی دوعا دەخوێنێ یاخود یەکێکیتر ئاوی دەداتێ لەپەرداخێکدا بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا هەمووی بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە بەدەر لەزەیت.
*ئەگەر رووخساری خۆی بەچەورکراوی بەدیکرد پیاوێکە بەدرێژایی ساڵ بەرۆژو دەبێت.
*ئەگەر چەورکردن بەجیوەبوو پیاهەڵدانی چاکەو بۆنو بەرامی چاکە لەنێو خەڵکیدا.

*چەوروکاری گرێو کۆڵنجو لوو یان جومگەو شوێنێك ژانبکات بەڵگەیە لەسەر چاکیو نێوانخۆشی لەگەڵ مارەیی هەڵگرتن بەهۆی هاوسەرگرییەوە ، یان پەیمانبەستن لەسەر چەك.
*ئەگەر رۆنێك تێکەڵ بەئاو بکات لەدەفرێکدا ماڵو دارایییەکی بەبێماندوبوون دەستدەکەوێت، ئەگەر لەنێو رۆنەکەدا میسك هەبوو یاخود بۆنیخۆش پیاهەڵدانی باشە بەچەشنێ کەپیاهەڵدراو ئەوسیفەتانەی تێدانییە.
*ئەگەر سەری چەوربکات رووپامایی‌و کاسەلێسی بۆ بەرپرسەکەی دەکات.
**رۆنفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە کاری پەنهانو نهێنی ئەنجامدەداتو خۆی پێی جوانو رازاوە دەکاتو زیانبەخشە.
*بینینی بەڵگەیە لەسەر:
+روپامایی‌و قسەی زاقو بریق.
+یەکێك بەڵێنو پەیمان بەسەر نەبات.
+درۆزن لەوتەکانیدا.
+شکۆمەندی‌و دەستەڵات.
(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زانیاری‌و رێنمایی‌و باوەڕهێنانی بێباوەڕو خزمەتگوزاری

زانستپەروەران و نزیکی فەرمانڕەواو دەستەڵاتداران.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زانایەکی گەورە هونەر دەنوێنێ لەچاکەکانداو هاوکاری خەڵکیدەکات لەزانیاریی و ماڵدا.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری و گۆڕانی حاڵی لەرەبەنییەوە بۆ هاوسەرداری.

*رۆنفرۆش پیاوێکی خۆشحاڵەو لەژێرسێبەری ئەو کەسەدا دەژی کەشوێنیکەوتوە.

*رۆنفرۆش پیاوێکە دەستدەگرێ بەماڵ و سامانی پیاواندا، چونکە چەوری ماڵ و داراییە، ئەگەر بینی چەوری دەفرۆشێ سوودێکی دەستگیر دەبێت و لەژێر سایەی مرۆڤێکی دەوڵەمەندو خاوەن ماڵ و داراییدا دەژی.

**رۆنی گونجی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کۆکردنەوە دنیاو قیامەت گەرمکراوی رێنومایییەو سورەوەکراوی باشترین پلەوپایەیەو خواردنی چەوریش رزق و رۆزیی و پشوو پایەبەرزییە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرکرداری چاک و زانیاری بەسوود.

**رۆیشتن:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەربینی بەرێکی دەڕوات بەرێوە داواخوازی شەرعی ئیسلامەو رزق و رۆزی خێریش دەدرێ.

*ئەگەر لەبازاڕ رۆیی وەسیەتنامەیەك لەدەستیدایە، ئەگەر شایستەی دەستەڵاتبوو پێیدەبەخشرێ.

*ئەگەر بەپێی پەتی رۆیشت بەرێوە رەواندنەوەی غەم و پەژارەو بەسەرچوونی ئاینە.

*بەرێکی رۆیشتن خۆبەکەمزانینە لەبەر خودا.

*هەروەها رۆیشتن بەڵگەیە لەسەر رزق و رۆزی بەپێی ئایەتی: ﴿فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ﴾ (الملك:١٥).

*رۆیشتن بەراکردن سەرکەوتنە بەسەر دوژمندا.

*رۆیشتن بۆ دواوە بەڵگەیە لەسەر پاشگەزبوونەوە لەکارێك دەستپێکردوە، ئەگەر دەستی پێنەکردبوو دەوەستێ لێی.

*دەگونجێت گەڕانەوە بۆ دواوە بەڵگەبێت لەسەر لێکچوونی ئاین و گۆڕانی حاڵ وبار.

*ئەگـەربینی بەچەشـنی خۆبـەزلزانین دەڕوات بەڕێوە بەڵگەیەلەسەر رەوشتی خراپو کرداری نابەجێی.

*ئەگـەربینی رۆیـشتو بەدەماکـەوت دنیـاو قیامـەتی لەکیسدەچێت بـەپێی ئایەتی: ﴿انْقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةَ﴾ (الحج:١١).ئەگـەر هـەڵنوتا لەرۆیـشتندا یـان لەهـەوڵو کۆشـشدا کارێـك رووی تێـدەکاتو گوناهی تیا ئەنجامدەدات.

*ئەگـەر قاچـێکی هـەڵنوتا بەڵگەیـە لەسەر سووکایەتیو رووتێکردنی کـاری خراپو نابەجیێ.

*ئەگـەر رۆیـشتن هەوڵوکۆشـشبوو بـۆ کارێـك بەڵگەیـە لەسـەرکرداری چـاكو باشی.

*رۆیـشتن بەڵگەیـە لەسـەر سـەفەرو مەترسیو پشتبەستن بەخودا.

*ئەگەر سەری دانەواند بـۆ خـوارەوەو بەوشێوەیە رۆیشت تەمەنیدرێژ دەبێ.

*رۆیشتن بەسەر ئاسماندا بەنێوبارانـدا تێپەڕینە.

*ئەگەر لەسەر سێقاچ رۆیشت بـەڕێوە بەدارێکـەوە بـەهۆی گـەورەیی تەمـەن یان نەخۆشیەوە با خـۆی بـدات بەسـەر گۆچانێکدا.

*ئەگەر بینی لەسـەر یـەك قـاچ دەڕوات بەڕێوە بـ لگەیە لەسەر رۆیشتنی نیوەی ماڵو تـ۔مەنی.

*ئەگـەربینی چـەند لاقێکـی هەیـەو پێوەی دەڕوات کوێر دەبێتو پێویستی بەیەکێکـە پێـی بـڕواتو رێگـەی نیـشانبدات ئەگـەر هاوچەشـنەکانی لاوازبوون.

*ئەگەربینی فەرمانڕەوا خاوەنی چـەند لاقێکـەو پێـوەی دەڕوات لادەبـرێو نـاتوانێ بـڕوات بـەڕێوە مەگـەر لەگـەڵ وەکیلەکانی.

*ئەگـەر پێکهاتـە رەقو بێگیانـەکانی بینی دەڕوات وەك چیاو ئاسن بەڵگەیە لەسـەر نارەحـەتیو دابـەزینی بـەڵاو نەهامەتی. دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سـووربوون لەسـەرکارباری ئـاینیو دنیاییـەکانو پـشتگیریکردن لەلایـەن خـوداوە بەتایبـەت ئەگـەر رۆیـشتنەکە بەرێکیبوو.

*رۆیـشتنی مـرۆڤ وەك ئـاژەڵ بەڵگەیـە لەسەر خۆ چـواندن بەرەوشـتی نـەزانو گێلـەکان مەگـەر گۆشـتی ئـەو ئاژەڵـە بخـوریێ لـەنێو خەڵکیـدا خێروچـاکە ئەنجامـدەدات، وەگـەرنا دووڕوویـی بڵاودەکاتـەوە لـەنێو خەڵکیـداو روو لەکاروکردارێك دەکات پێیناگات.

**ڕۆیشتنی خێرای دوژمن:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەی تالآنیو ڕەوشت نزمییە کەلەسەریەتی.

## ره

**ڕەخمە**[1]: مرۆڤێکی گێلو کەودەنە، بەرۆژ نەخۆشییە ، هەڵگرتنی بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی جەنگو خوێنڕشتن ، بۆنەخۆش بەڵگەیە لەسەر مەرگ.

*ئەگەر کۆمەڵێ لەم باڵندەیە ببینێ دەچێتە نێو وڵاتێك کۆمەڵە سەربازێکی حەرامخۆر دادەبارێن بەسەر دانیشتوانەکەیدا.

*هەروەها بەڵگەیەلەسەر:

+خەڵکی بێکارەی جنێوفرۆش.

+مردووفرۆش.

+مردوانی گۆڕستان.

*ئەگەر نەخۆشێك ئەمجۆرە باڵندەیەی لەماڵی خۆیدا بینی دەمرێت یاخود لەمەرگ نزیکدەبێتەوەو لەنەخۆشییەکەی چاکدەبێتەوە.

*بۆ دەباخچیەکانو گڵێنەکارانو ئەوانەی پیشەکانیان لەدەرەوەی وڵاتە بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانج، بەڵام بۆ پزیشكو نەخۆش بەڵگەیە لەسەر شەڕو خراپە.

[1] **ڕەخمە**: باڵندەیەکی بەڵەك بەڵەکەو لەهەڵۆ دەچێ لەهەڵسوکەوتدا. (وەرگێڕ)

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+دوژمنو هاتنی کۆمەڵێکی سووكو نزمو هاتنیان ڕووبەشار.

+خەڵکی بێکاروکاسبی.

+مردووشۆر.

+ئەوانەی ڕوو لەگۆڕستاندەکەن.

+دزو جەردەی خۆهەڵسپێر لەنێو دیوار یان حەرامخۆر لەکاروبژێویدا.

+جیاوازیو ناڕەحەتیو شوێنی وێرانو قسەی ناشیرین.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی لەماڵی خۆیدا بەدیبکات پەناوپشتگیرە بۆی نێردراوە.

**ڕەخنەگر:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیەلەسەر:

+ڕێنومایی.

+شانازی دڕندەکان.

*ڕەخنەگر پیاوێکی هەڵبژاردەیە لەهەموو شتێکی خراپ خۆیدەپارێزێو شتی باش هەڵدەبژێرێ، ئەگەر دیندارو زانستخوازبوو باشترین زانیاری بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ لەگەڵ کارە شکۆمەندییەکانی ئاین ، ئەگەر دنیاویستبوو باشترین شێوەی دنیایە بۆ خۆی.

*ئەگەر دەستەڵاتداربوو باشترین‌و بەرزترین دەستەڵات بۆ خۆی دیاریدەکات.

**ڕەسەن:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی شتی ڕەسەن بەڵگەیە لەسەر خزمەتکار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاتنی هەواڵی سەیرو ئەوەی بەگەڕ دەخریٚ‌و ئارەزووی ئامادەکردنی جنۆکەو داواوخوازکردنیان.

**ڕەشاش:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر باران‌و نمەو ڕشێنەی زەوی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر باش‌وچاکبوونی حاڵ‌وبارو ڕەواندنەوەی خەون‌و غەم‌و پەژارە.

**ڕەشسوور:** (نابلسی) دەڵێت: ئەسپی ڕەشسوور لەخەودا شکۆمەندی‌و مەزنییە هەروەها دەڵێن: ژنێکی دەوڵەمەندە.

**ڕەشەبا:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ڕەشەبا بەڵگەیە لەسەر دەستەڵاتدار بەهۆی هێزو توانایەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر موڵکی دەستەڵاتدارو سەربازو فەرمان‌و خزمەتکارو پشتگیرەکانی، ڕەشەبا خزمەتکاری (سولەیمان) بوو(سەلامی خوای لێبێت).

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سزاو بەڵاو نەهامەتی‌و ئەوەی لەدار دەکەوێتەخوارەوەو ئەوکەشتیانەی نوقمدەبن بەتایبەت ئەگەر بای خۆرنشینبوو.

*دەگونجێت ڕەشەبا بەڵگەبێت لەسەر فەڕوخێرو ڕزق‌و ڕۆزی‌و سەرکەوتن‌و مژدە چونکە پەروەردگار بەمژدە دەینێریٚ‌و سۆزو بەزەیی هەڵگرتوەو کەشتیەکانی دەریای پیٚ ڕزگاردەکات وێڕای کارلێکی پیتێنکردن ئەنجامدان بەهۆیەوە.

*پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت: "سەرکەوتم بەهۆی بای خۆرهەڵات‌و عادیش تیاچوو بەهۆی بای خۆرنشین".

*دەگونجێت ڕەشەبا بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی‌و دەردو خرۆشانی خەڵکی وەك هەڵامەت‌و سەرئێشە.

*ئەگەر بینی ڕەشەبایەك هەڵیدەگریٚ‌و هیچ ناترسیٚ‌و تاریکایی‌و تەم‌و مژ نابینیٚ دڵ‌ودەروونی خەڵکی داگیردەکات یان دەبێت بەفەرمانڕەوا یان گەرشایستەبێت‌و ئەوانیش گاڵتەو سووکایەتی بەخزمەکانی دەکەن، یان

بەسەلامەتی سەفەردەکات بەدەریادا ئەگەر شایستەبێت یاخوازیاری ئەو کارەبێ یان پیشەوکاسبی دەبوژێتەوە ئەگەر رامابێ ، بەلأم ئەگەر بایەك لەژێریدابوو گواستیەوەو بەرزیکردەوەو رزقو رۆزی دەدرێ ئەگەر هەژاربێت.

*ئەگەر بەرزیکردەوەو بەکێشیکردو خۆشی دەترساو نیگەرانو دوو دڵبوو، یاخود تاریکاییو تەپو تۆزی هەبوو ئەگەر لەکەشتیەکدابێت کوندەبێ، ئەگەر نەخۆشو دەردەداربێت حاڵی خراپتر دەبێ ، وەگەرنا زەمینلەرزەو کاروباری ناقۆلا روودەدات یان بریارەکانی فەرمانرەوا بەسەریا جێبەجێدەکرێت هەروەك چۆن لەخەوەکەدا گەیشت بەو دەرەنجامە، ئەگەر هیچکام لەو حاڵو بارانە نەبوو فیتنەو ئاشووبو رووی تێدەکاتو لەرزێنەرو کاریگەردەبێ.

*ئەگەر بینی رەشەباکە دار لەبندەردەهێنیو دیوار دەروخێنیو خەڵکیو باڵندە هەڵدەفرێنیو خواردن پەرشو بلأودەکاتەوە بەلأو نەهامەتیەکی گشتیە روو لەخەڵکیدەکات ، دەگونجێت تاعونو نەخۆشی بێچارەسەربێت یان کوشتارو فیتنەو تالأنیو ستەمکاریو هاوچەشنی ئەو رووداوانەبێت.

*ئەگەر رەشەبا گشتییەکە هێوربوو یاخود بای پیتێنبوو ئەگەر خەڵکی لەنارەحەتیدابوون یاخود گەمارۆدرابوون لەلایەن دوژمنەوە حاڵوباریان دەگۆرێتو غەمو پەژ ەکانیان دەرەوێتەوە.

*رەشەبای ژاراو، نەخۆشییە، رەشەبا لەگەڵ زەردیدا نەخۆشییە.

*رەشەباو هەورەبروسکە دەستەلأتدارێکی ستەمکارە.

*ئەگەر رەشەبا لەشوێنێکەوە بیگوێزێتەوە بۆ شوێنێکیتر دەستەلأت بەدەستدەهێنێتو سەفەرێك دێتە رێو ناگەرێتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴾ (الحج:٣١).

*هەڵکردنی رەشەبا بەسەر شارو سەربازدا ئەگەر لەجەنگدابن تیادەچن.

*ئەگەر شنەی شەماڵبێ و خێرو بەرەکەتە.

*رەشەبا ستەمی فەرمانرەواو دەستەلأتدارە.

*رەشەبا لەگەڵ تەمو مژدا بەڵگەی جەنگو شەرە.

(نابلسی)دەڵێت: ڕەشەبا مژدەی پەروەردگارە، ئەگەر ڕەشەبا هیچ شایەتێکی خێری لەگەڵدانەبوو بەسەرچوونی خێرو بەرەکەتە لەوشوێنەدا ، ئەگەر ویزەویزی لەگەڵدابوو سزاو خەشمە.

*ئەگەر فەرمانڕەوایەك بینی ڕەشەبایەکی گەردەلوولاوی هەڵیکردو دەچێت بەرەوکوشتار سەرکەوتوو دەبێت، ئەگەر بینی ڕەشەبایەکی گەردەلوولاوی لەشوێنێکدا هەڵیکرد خانەوادەکەی ترس‌و بیم‌و ناڕەحەتی بەئەندازەی هێزی ئەو ڕەشەبایە ڕوویان تێدەکات، ئەگەر داری لەبندەرهێنا پادشاو فەرمانڕەوا توڕەدەبێت لەکۆمەڵێك‌و لەشوێنی خۆیان ڕاگوێزیاندەکات.

*بای ڕۆژهەڵات ڕەحمەتەو هی ڕۆژئاواش خراپە.

*ئەگەر ڕەشەبایەکی توندی بینی هەڵیکرد بەڵاو نەهامەتییە.

*ئەگەر بایەکی بینی دارخورمای لەبندەرهێنا پیاوی ئەو شوێنە بەدەستی فەرمانڕەوا دەکوژرێت.

*بای ڕۆژئاوا بەڵگەیە لەسەر بەڵاو نەهامەتی‌و نەخۆشی‌و مەرگ‌و تیاچوون لەو شوێنەدا، هەروەها دەڵێن: باران‌و رزق‌و ڕۆزییە.

*ئەگەر بینی ڕەشەبا بەهێمنی هەڵدەکات بەڵگەیە لەسەر ڕازیبوون لەسەر ڕای کۆمەڵێکی خراپ خاوەن ڕاوتەکبیرنیین.

*شنەی با ئەگەر لەلایەکی دیارو ئاشکراوە هەڵیکرد بەڵگەیە لەسەر هەواڵی باش‌و ڕەحمەتدار.

*ڕەشەبا بەڵگەیە لەسەر داواخوازی پێداویستی‌و زەحمەت ئەگەر لەلایەکی دیارەوە هەڵیکرد.

*ڕەشەبا بەڵگەیە لەسەرداواخوازی پێداویستی‌و ناردنی نوێنەر.

*ڕەشەبای خۆرهەڵات سەرکەوتنەو هی خۆرئاواش ملکەچییە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەرووی خێرو ڕەواندنەوەی غەم‌و پەژارەو چاکبوونەوە لەنەخۆشی‌و هەواڵیخۆش.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەری چاك‌و خۆشڕەو.

*ئەگەر لەخەودا ڕەشەبایەکی سووری دی بەڵگەیە لەسەر ئازاردانی دایك‌و باوك یاخود ئەنجامدانی کاری خراپ‌و نابەجێ.

**ڕەفە( تاق )**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پارێزکار لەنهێنی‌و

داپۆشەری کەم و کوڕیی و هاوسەری باش و پەناوپشتگیر.

*ئەگەر بینی ڕەفەیەکی هەیە هەندێك لەئامێرەکانی لەلای سەرەوە دانراوە تێدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوداوەند کوڕێکی پێدەبەخشێ زۆر زیرەك و زانا دەبێت لەسەرجەم هونەرەکاندا یاخود ژنێکی داوێنپاك و نهێنیپارێز.

**ڕەگ(دەمار):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ڕەگ خانەوادەکەیەتی دەدرێتەپاڵ ئەو ماڵەو جوانی ڕەگ و دەمار جوانیانەو ناشیرینیان ناقۆلایی و ناشیرینییە.

*ئەگەر لەخستنەڕوودا ئارەقیکردەوە دەگونجێت یەکێك لەخزمەکانی بمرێت یاخود دەگونجێت خۆی لەخزمەکانی داببڕێت بەمەرگ ئەگەر خەوەکە شتێکی تێدابوو بەڵگەبێت لەسەر خراپە یان سەرپێچی.

(نابلسی)دەڵێت: ڕەگ و ریشەی نەوەی ئادەم و خزمەکانی ئەگەر بڕا لەخزمەکانی جیادەبێتەوە بەمەرگ یان نێوان بچڕان.

*ڕەگ و ریشە وەك ڕووەکی بێستان و کێڵگە وایەو بۆ خاوەن کێڵگە دەگونجێ ئەو ڕووەکەبێت ئەگەر شتێکی لێبڕێ یان خوارد شتومەکی کێڵگەو بێستانەکەیەتی، ئەگەر ئەوەی دەیخوات لەخەودا دیو و نەیدەشاردەوە بەڵگەیە لەسەر وەبەرنەهێنانی ئەو ڕووەکەی دەوی دەدات یان لەکیسچوونی.

*ئەو ڕەگ و دەمارانەی بەشا دەمار ناسراون و ژیانی پێوەبەندە بەڵگەیە لەسەر ژیان و ڕزق و ڕۆزی و گەورە پیاوانی خزم وکەس وکار.

*ئەگەر ڕەگ و دەمارەکانی دەستی بینی خوێنی لێدێت ئەگەر دەوڵەمەندبوو ماڵ و دارایییەکەی دەڕوات بەئەندازەی لەبەر ڕۆینی خوێنەکەو ئەگەر هەژاربوو ماڵ و سامان بەدەستدەهێنێ.

**ڕەگی بن گوێچکە:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی ئەو ڕەگەی تەقی و خوێنی لێهات دەمرێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پەیمان و سووربوون لەسەرکارو فرمان.

**ڕەمکە**[1]: لەخەودا کچ یان ژنێکی ئازادی بەئابڕووە ، ئەگەر خەوبینەر چوەسەر پشتی کاری داوێنپیسی لەگەڵ ژنێکدا ئەنجامدەدات.

*بەڵگەیە لەسەر کەسانێکی دیارو نەناسراو بەرەوشتبەرزی.

---

[1] **ڕەمکە:** جۆرە گیاندارێکە. (وەرگێڕ)

*ئەگەر بینی سوارییوە یاخود بوە بەخاوەنیو کرێیوەتی ئەگەر رەبەنبوو هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی رێزداری بەئابڕووی پیرۆزدا دەکات.

*ئەگەر رەشبوو ژنێکی رێزداری بەئابڕوە.

*ئەگەر خۆڵەمێشیبوو ژنێکی جوانە.

*ئەگەر سوربوو ئایندارە، ئەگەر زەردبوو نەخۆشیو دەردەدارە، ئەگەر زەردبوو کورێکی لێدەبێت، ئەگەر پیاوەکە هاوسەرداربوو یان لەوانەبوو چاوەڕێی هاوسەرداریان نەدەکرد روو لەگوندو ناوچەیەکی چەپەکدەکاتو بەسوودو قازانج دەگەڕێتەوە بۆ بژێوی.

*ئەگەر بینی رەمکەکەی مرد یان دزرا یاخود ونبوو دیارنەما رووداوێك روو لەهاوسەرو بژێویدەکات.

*ئەگەر بینی وازی لێهێناو دەستبەرداریبوو یاخود هاتەخوارەوەو لەسەری بەمەرگ لەژنەکەی جیادەبێتەوە یان تەلاقیدەدات یاخود لەماڵو ناوچەکەی دەچێتە دەرەوە.

*ئەگەر بینی رەمکەکەی دەناڵێنێ بژێوی دەژێتەوەو ماڵو دارایی زیاد دەکات.

*ئەگەر بینی شیری دەخوات دەستەلاتدار نزیکیدەخاتەوە لەخۆیو خێروچاکەی لێوە دەستگیردەبێت.

**رەنجدان:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بۆ نەخۆش مەرگەو، هەوڵو رەنجدانیشە بۆ ماڵو منداڵ.

**رەنگ ئەسمەر:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جیاوازی رەچەڵەك.

**رەنگزەردی:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی رەنگی دەموچاوی زەردهەڵگەڕاوە نەخۆشدەدەکەوێ.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر دەموچاوی بەزەردیو لاوازی بینی دەبێت بەرێنومایدەر لەقیامەتداو لەکەسە نزیکەکاندەبێت.

*رووزەردی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ملکەچیو ئیرەیی بردن.

*دەگونجێت زەردی رووخسار نیشانەی دووڕوویی بێت.

*هەروەها دەڵێن: رەنگزەردی بەڵگەیە لەسەر بەندایەتیو شەونوێژ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر عیشقو خۆشەویستی.

*رەنگزەردی بەڵگەیە لەسەر ملکەچیو چاودێری.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ترس‌وبیم.
* ئەگەر رووخساری بەسپێتی بینی‌و لەش‌ولاریشی بەزەردی کردارە بەرچاوەکانی باشترە لەنهێنیەکانی.
* ئەگەر لەش‌ولاری بەسپێتی بینی‌و رووخساری بەزەردی کردارە پەنهانەکانی باشترە لەکردارە دیارو ئاشکراکانی.
* دەموچاوو لەش‌ولار زەردبوون بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی.
* دەموچاوو لەش‌ولار زەردبوون بەڵگەیەلەسەر نەخۆشی.
* دەموچاو زەرد بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارە کەروو لەخەوبینەر دەکات.
* زەردی پۆشاك‌و جل‌وبەرگ نەخۆشی‌و لاوازی خاوەنەکەیەتی مەگەر جل‌وبەرگەکە ئاوریشم بێت ئەوجا خراپی ئاینە.

**رەنگی رەش:** (نابلسی) دەڵێت: رەشی لەخەودا ماڵ‌وسامانە، پۆشینی جل‌وبەرگی رەش بۆیەکێك راهاتبێت لەسەر پۆشینی دەوڵەمەندییەو بۆ ئەوەی رانەهاتوە غەم‌و پەژارەیە.

(ئیبن سیرین)هەموو رەشییەکی بەماڵ‌و سامان داناوە، کەمی‌و کورتی تەمەن کورتییە.

* ئەگەر بینی ژنێکی رەشی کورتەباڵای هێنا رەشییەکەی زۆری ماڵ‌و سامانەکەیەتی‌و کورتیەکەشی تەمەن کورتییە.
* ئەگەر رەشی قەترانیبوو مەزنی‌و شکۆمەندییە لەلایەن دەستەڵاتدارەوە پێی دەبەخشرێ.
* هەندێکدەڵێن: بینینی رەنگی رەش باش نییە چونکە دەستەواژەکەی خراپەی هەڵگرتووە.
* رەشی لەش‌ولار: شکۆمەندییە ، دەگونجێت خەوبینەر بکەوێتە گوناهێکی گەورەوە یاخود سکاڵای لەدژ تۆمار بکەن یان ئازاری دڵی دایك‌و باوکیبدات.
* دەگونجێت هەردوو دەستی یا قاچی شەق ببات.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆشحاڵی، ئەگەر رووخساری رەشبوو بەدەر لەلەش‌ولاری بەڵگەیە لەسەر درۆو پاشگەزبوونەوە لەئیسلام.
* ئەگەر رەشێك سپیبوو بەڵگەیە لەسەر پیاهەڵدانی باش‌و چاك‌و پاشگەزبوونەوە لەگوناهو تاوان‌و باوەرهێنان دوای بێباوەری.
* ئەگەر هەردوو دەستی بەدەر لەلەش‌ولاری سپیبوو بەڵگەیە لەسەر

دەرکەوتنی کەرامات و کاری لەرادەبەدەر بۆچاکەکاران و زاڵبوون و سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا و نزیکی لەپیاوانی گەورەو ناودارو پلەبەرزی.

*دەگونجێت رەشی بەڵگەبێت لەسەر زاڵبوونی رەشی بەسەر سپێتی لەشولاردا.

*سپێتی بەڵگەیە لەسەر بەڵەك بەڵەکی لەلەش و لاری رەشدا.

**رەنگی سوور:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پلەوپایەیە، ئەگەر بینی رووی سوورو رۆشنە دەبێت بەرێنومایی‌دەر لەدنیاداو خەڵکی رێنوێنیدەکات بۆ خێرو چاکە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر لەگەڵ سوورییەکەدا سپی تێکەڵبوو خاوەنەکەی پلەوپایەو شکۆمەندی و شادیی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی رووخساری پیسبوە بەرەنگی سوور تووشی زیناو داوێنپیسی دەبێت و ئابرووی دەچێت.

*ئەگەر بینی لەشولارو رووخساری سووربووە غەم و پەژارەی درێژ دەخایەنێت و درەنگ دەرووی لێدەکرێتەوە.

*رەنگی سوور بەڵگەیە لەسەر دەرەنجامی نەخۆش و گەرانەوەی کەسی موسافیرو گەشتیار.

**رەوانبێژی (زمانپاراوی):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا عەجەمییەو رەوانبێژبوە رێزو شکۆ بەدەستدەهێنێ لەگەڵ دەستەلاتێکی بێهاوتا، ئەگەر دەستەلاتداربوو دنیا بەدەستدەهێنێ، ئەگەر بازرگانبوو لەلای خەڵکی باسدەکرێ و ناوبانگ دەردەکات و لەهەموو پیشەیەکیشدا هەربەو شێوازەیە.

*ئەگەر بینی بەهەموو زوبانێك دەدوێت دەبێت بەخاوەنی کارێکی مەزن لەدنیاداو شکۆمەند دەبێ.

*رەوانبێژی شکۆمەندی و دەستەلاتە.

**رەوگەحوشتر:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ماڵ و دارایییەکە بەمیراتی دەمێنێتەوە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر جیاوازی یاخود سەرمایەی حەلاڵ و دروست و ئاسانبوونی کاروباری قورس.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر هەرەتی لاوی و نەشونماکردنی و گواستنەوەی یاخود بەڵگەیە لەسەر منالێك بەزوویی لەدایکدەبێت یاخود بەڵگەیە لەسەر ئەو منداڵەی لەباردەچێت.

**رەهن (بارمتە):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی بەبارمتە دانراوە لەشوێنێکدا خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا گوناهی ئەنجامداوە.

*هەروەها ئەگەر بینی کراوە بەبارمتە لەشوێنێکدا خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەنجامدانی گوناهێکی زۆر بەپێی ئایەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾ (المدثر: ٣٨).

*هەروەها دەڵێن: رەهنکراو دیلو ئەسیرە ، ئەگەر بینی رەهنێك لەلای دانرا لەشتێکدا ستەمدەکاتو مافی خۆی پێنادات ئنجا بەهۆی رەهنکراوەوە دەگات بەحەقی خۆی.

*رەهنکراو دیلو بەندە بەهۆی گوناهو تاوانەوە رەهنداریش بەهەمان شێوازە.

*رەهن لەجێگیربوونی شتێكو بەردەوامی وەرگیراوەو، بەڵگەیە لەسەر زانینی ئابڕوچوونو کەوتن بەسەریا یاخود ئەوەی مرۆڤ وابەستەدەکات.

*دەگونجێت رەهن بەڵگەبێت لەسەر تاقیکردنەوەوخۆشەویستی هەتا دڵی وابەستەی دەبێت.

*ئەگەر لەخەودا شتێکی گرانبەهای رەهنکرد بەسەرشتێکی هیچو بێبەهادا ئەوە تاقیدەکرێتەوە بەخۆشویستنی کەسێکی ناپاكو رێزو پایەیەکی مەزنی لێدادەماڵێ.

*دەگونجێت رەهن بەڵگەبێت لەسەر گومانی خراپ بردن بەرەهنکارو ئەوەی رەهندەکرێ.

*دەگونجێت رەهن بەڵگەبێت لەسەر سەفەر.

## ری

**ریپۆق:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تێکەڵبوونو رەوشتی پیاوخراپان.

**ریخۆڵە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: دەرکەوتنی ریخۆڵەو ئەوەی لەنێویدایە ماڵوسامانی هەڵگیراوە یاخود کەسێك لەخانەوادەی دەردەکەوێ ولات بەرێوەدەبات یان خۆی دەبیات بەرێوە.

*ئەگەر ریخۆڵەی خۆیخوارد بەڵگەیە لەسەر خواردنی ماڵی خۆی ، بەهەمان چەشن ئەگەربینی ریخۆڵەی کەسانیتر دەخوات یان ئەوەی لەناخی کەسێکی تردایە ماڵێکی هەڵگیراو بەدەستدەهێنێو دەیخوات.

*هەروەها هاتنەدەرەوەی ریخۆڵە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کچەکەی دەستنیشاندەکرێ.

*ئەگەربینی هەموو ریخۆڵەی یان ئەوەی لەنێو سکیدایە هاتە دەرەوە

سکی شتو گەڕاندیەوە نێوی یان مەرگیەتی لەرەزامەندی خودایا.

*ئەگەر لەنێوسکی شتێك هاتەدەرەوە ئامۆژگارییەکی هەیە بۆ پیاوێكو کچێك.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر لەسکی هاتە دەرەوە بەڵگەیە لەسەر پچڕانی پەردەی نهێنی.

*ئەگەربینی پادشاو فەرمانڕەوایەك سکی ژێردەستەکانی هەڵدڕی سکیان دەیشکێنێ، ئەگەر سکی بردن ماڵەکانیان دەبات.

*ئەگەربینی ورگو ریخۆڵەی لەشوێنی خۆیەوە شەقکرا باشە بۆ یەکێك کوڕی نەبێت ، هەروەها باشە بۆ هەژار چونکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کوڕی نییە کوڕیدەبێت ، بۆ هەژاران دەوڵەمەند دەبن چونکە کوڕان وەك ریخۆڵەوان.

*ئەگەربینی کەسێکیتر ریخۆڵەکانی دەرکەوتو لەوەدا کارێکی خراپ بەدەردەکەوێت پاشان کاروباری نهێنییەوە بەدەردەکەوێت.

*ئەگەر مرۆڤێك بینی سکی شەقیبردو هیچی تێدانەبوو بەڵگەیە لەسەر وێرانبوونی لانەو ماڵو تیاچوونی منداڵەکانیو بێزاری ، بۆنەخۆشیش بەڵگەیە لەسەر مردن.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا لەسك هاتە دەرەوەو دەرکەوت بەڵگەیە لەسەر کچان یان نەخۆشی خانەوادەکەی ، ئەگەر شەقیبرد بەڵگەیە لەسەر مردن.

*ریخۆڵە ماڵوسامانە ئەوەی خواردی ماڵی خۆیدەخوات، یاخود ماڵو سامانی شاراوەیە.

*ئەگەربینی ریخۆڵەی کەسێکیتر دەخوات ئەگەر وەکیلبوو وەکیلی ماڵی هەتیوە یاخود ماڵی پیاوێکیترە.

*ئەگەربینی ریخۆڵەیەکی زۆردەخوات گەنجینەکان ئاوەلا دەکرێتەوەو بەدەستیدەهێنێت.

**ریز** : (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تەبایی دڵەکان لەبەرانبەر دوژمنداو هەڵسانو بەبەجێهێنانی مافەکان، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەرنەدانی ریزی موسوڵمانان.

**ریش:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی ریشی درێژ بوە زیاد لەئەندازەی خۆی خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو قەرزاری، ئەگەر درێژبوو هەتا کەوتە سەرزەوی بەڵگەیە لەسەر مردنی بەپێی ئایەتی: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ﴾ (طه:٥٥).

*ئەگەر ریشی بەئەندازەیەك درێژبوو هەتا نووسا بەسکیەوە ماڵو سامانو

پلەوپایە بەدەستدەهێنێ بەئەندازەی نووسانی موو بەسکیەوەو ماندوودەبێت تێدا ، ئەگەر بینی درێژییەکەی باشەو گونجاوە ماڵوسامانو پلەوپایەو بژێوییەکی باش بەدەستدەهێنێ.

*هەروەها وتراوە: ئەگەر موەکەی درێژبوو هەتا گەیشتە سەر ناوکی بەڵگەیە لەسەر نەبوونی گوێڕایەڵی خودا ئەگەر بینی ئەملاولاکەی درێژبوو بەدەر لەناوەڕاستەکەی شتێك بەدەستدەهێنێ کەسانی دی بەدەستیان نەهێناوە.

*هەروەها دەڵێن: پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین) و دەڵێت: ریشم بەئەندازەیەك درێژبوو هەتا گەیشتە سەرناوکمو منیش تەماشام دەکرد، ئەویش وتی: تۆ بانگبێژیتو تەماشای ماڵانی دراوسێدەکەیت.

*ریش لەلێکدانەوەدا بۆ منداڵی باڵغ باش نییە.

*ئەگەر بینی ریشی کەسانیتری بەدەستیگرتو رایکێشا ماڵەکەی بەمیراتی بۆ دەمێنێتەوەو دەیخوات.

*کەمبوونەوەی ریش بەڵگەی ئاسانیو قەرزدانەوەو دەرووی خێرە.

*ئەگەر کەمبوونی زیادیکرد بەڵگەیە لەسەر سووکایەتیو بەفیڕۆدانی ماڵوسامانو پلەوپایە.

*ئەگەر بینی کەسێکی کۆستە دەدوێ لەگەڵ ژنەکەیدا کاروبارەکانی لێئاڵۆز دەبن بەئەندازەی خۆیو جیاوازی دەکەوێتە نێوان خۆیو خۆشەویستانی چونکە (ئیبلیس)کاتێ بەرنەفرەتی خواکەوتو لەشێوەی کۆسەدابوە.

*رەشی مووی ریش بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی زۆر ، ئەگەر رەشییەکەی رووبەسەوزبوو موڵکو دەستەڵاتو ماڵودارابیەکی زۆری دەستگیردەبێ، بەڵام یاخیو ستەمکار دەبێ چونکە ریشی (فیرعەون) بەوچەشنەبوە، زەردیشی بەڵگەیە لەسەر هەژاریو کەموکوڕی.

*ریشی سوور بەڵگەیە لەسەر خواناسی، ئەگەربینی ریشی خۆی گرتو موەکانی هەڵکێشاو گرتی بەدەستیەوەو فڕێی نەدا ماڵوسامانی لەدەستی دەردەچێت ، پاشان دەگەڕێتەوە نێوی.

*ئەگەر بینی فڕێیدا ماڵو سامانەکەی بەسەردەچێو ناگەڕێتەوە بۆی.

*زۆربوونی مووی سمێڵ خراپەو کەمیشی باشەو لێکدانەوەی هەڵکێشانی مووی سمێڵ بۆ دەوڵەمەند

زیادەڕەوییەو بۆ هەژاریش بەڵگەیە لەسەر کۆبوونەوەی دوو غەمو پەژارە لەسەر دڵی.
* هەروەها بەڵگەیە لەسەرئەوەی قەرزێك لەمرۆڤێکدەکات پاشان بەیەکێکیتری دەدات.
* ریشتاشین بەسەرچوونو تیاچوونیماڵو سامانوپلەوپایەیە ، ئەگەر بینی ئەو موانەی ریشیدەبڕیٚ کەلەمشتی دەردەچیٚ زەکاتی ماڵوسامانی دەدات.
* مووی سپی لەریشدا ویقارو هەیبەتەو خەنەش داپۆشینو پەنهانکردنە، ئەگەر سوورکردن بەخەنەبوو بەڵگەیە لەسەر وابەسنتەبوونی بەسوننەتەوە.
* ئەگەر بینی سەری بەخەنە سوورکرد بەدەر لەریشی نهێنی گەورەکەی دەپارێزیٚ ، ئەگەر بینی هەمووی خەنەکرد زۆر لەخۆیدەکات لەشاردنەوەی هەژاریداو داوای رێزداریدەکات لەلای خەڵکی.
* ئەگەر بینی بەقوڕ یان گەچ سەری خەناویدەکات داوای مەحاڵدەکاتو پاشان ناوبانگ دەردەکات.
* ریشی ژن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەرگیز منداڵی نابێت، گوتراویشە بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی.

* هەروەها دەڵێن: زۆربوونی ماڵو سامانی مێردو کوڕەکەیەتی یان ئابڕوو رێزداری کوڕەکەی.
* هەروەها دەڵێن: ئەگەر ئەو ژنە هاوسەرداربوو بەڵگەیە لەسەر غەیبەتکردنی مێردەکەی ، ئەگەر ژنیکی دووگیان ئەوەی بینی کوڕی دەبێتو خواستی بەجێدێت.
* هەروەها دەڵێن: ئەوەی ریشی درێژی بینی لەگەڵ قژدا تەمەنی درێژ دەبیٚو ماڵوسامانی زۆر.
* هەروەها دەڵێن: ئەو شتەی بەر لەکاتی خۆی دەبێت بەڵگەیە لەسەر شەڕ وەك ئەوەی منداڵی نێرینە ریشی لێدەربێت یاخود کچۆڵەی بچووك ببیٚ بەبووك ، سەرجەم ئەوشتانەی بەرلەکاتی خۆیان دەبن بەهەمان شێوازە بەدەر لەدواندنو قسەکردن چونکە دواندن بەڵگەی خێرە.
* ئەگەر منداڵێکی نابالغی بینی ریشی هەیە دەمریٚ بەرلەوەی بالغ ببیٚ، ئەگەر ئەو منداڵە نزیکبوو لەکاتی دەرهاتنی ریش بەڵگەیە لەسەر تەنیا کەوتنیو سەرقاڵی بەکاروباری خۆیەوە.
* دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم ریشم درێژبوە ، ئەویش وتی: شتێك

بەدەستدە ی کەسانیتر بەدەستی ناهێنن یان پێی ناگەن.

*گەنەمووی نێوان لێوی خواروو چەناگە شکۆمەندییەو مەردوم خۆی پێدەنوێنێ.

*ئەگەر بینی نیوەی ریشی تاشراوە هەژار دەکەویٚو شکۆمەندی بەسەردەچێ.

*ئەگەر لاوێکی نادیار ریشی تاشی شکۆمەندی بەدەستی دوژمن لەناو دەچێ.

*ئەگەر پیرەپیاوێك ریشی تاشی پلەوپایەی تیادەچێت بەئەندازەی سافیو لووسی، ئەگەر نادیاربوو رێزو شکۆ بەدەستی سەرۆکێکی خۆبەزلزانی زۆردار تیادەچێتو هیچ رەچەڵەكو بنەمایەکی نابێ.

*ئەگەر بینی بڕابوو ماڵوسامانەکەی لێی دەبریٚو بەئەندازەی مووی بڕاوی ریشی شکۆو رێزی تیادەچێت.

*ئەگەر بینی ریشی تاشراوە رووی ناشیرینو ناقۆلا دەبێ لای خانەوادەو هۆزو کەسەکانیو تاشینیش ئاسانترە لەهەڵکێشان ، دەگونجێت هەڵکێشان باش بێت بۆ هەندێك لەکاروبارەکانی ئەگەر رووخساری ناشیرین نەکات بەڵام چاکیو باشییەکەی نارەحەتی تێدایە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم چنگم کرد بەریشی مامداو توند بەکێشمکرد هەتا دەرمهێنا، ئەویش وتی: تۆ چاوەڕێی میراتی مامت دەکەیو بەتەنیا تۆ میراتگری بەو ئەندازەیە دەبی بەمیراتگری.

*ئەگەر بینی ریشی سپیو تیشکدارە شکۆمەندیو پلەوپایەو وتاری باش لەوڵاتدا بەدەستدەهێنێ، چونکە ریشی حەزرەتی (ئیبراهیم) (سەلامی خوای لێبێت) سپیبووە.

*ئەگەر بینی شانەکرابوو رێزو ویقار بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی ریشی زۆر رەشەو لەکاتی بێداری باشترە هەیبەتو سامو شکۆمەندیو جوانیو ماڵو سامان بەدەستدەهێنێ، ئەگەر بینی سپیبوو کەمێك رەشی تێدامابوو هەیبەتو ویقارە ، ئەگەر هەر هیچ رەشییەکی تێدا نەمایەوە هەژار دەکەویو پلەوپایەو شکۆی تیادەچێت.

*پیاوێك هات بۆلای (ئیبن سیرین)و وتی: لەخەودا بینیم ریشم سپی بوەو منیش بەخەنە سوورمدەکرد بەڵام رەنگی خەنەی نەدەگرت، ئەویش وتی: سپێتی کەموکورییە روو لەمولكو

دەستەڵاتت دەکاتو تۆش خوازیاری شاردنەوەیت بەڵام هەر ئاشکرادەبێ، پیاوەکە وتی: راستدەکەی.
(نابلسی)دەڵێت: ریش لەخەودا دەوڵەمەندی‌و شکۆدارییە ، ئەگەر لەمشتدەرچوو پیاوێکی گوماندارە.
*ئەگەر مندالێکی نابالغی بینی ریشدارە دەمریو بالغ نابێ، ئەگەر نزیکبوو لەوەی ریشی لێدەربێ بەتەنیا سەرقاڵی کاروباری خۆیدەبێ.
*ئەگەر بینی ریشی کەموکوڕی تێدایەو کەمە ئەگەر قەرزاربێت دەیداتەوە، ئەگەر کاروباری ئەستەمو قورس‌و گرانبێ بۆی ئاساندەبێ، ئەگەر غەمبار بێ غەمو پەژارەی دەدرێتەوە، ئەگەر ریشی پربوو بەڵام کەمو کورییەکی زۆری تێدابوو شکۆمەندی تیادەچێت‌و لای خەڵکی سووک‌و رسوا دەبێ.
*ئەگەر بینی ریشی نەما حاڵوباری لەکیسدەچێ.
*ئەگەر بینی ژنەکەی ریشی هەیە زیادبوونی ماڵودارابیە یان هی کورەکەی‌و نەخۆشکەوتنی ژنەکەی.
*هەروەها دەڵێن: ریشی ژن بەلگەوندنەیە لەسەر ئەوەی هەرگیز کوری نابێت ، ئەگەر کوری هەبوو کاروباری خانەوادەکەی دەبات بەرێوە.
*ئەگەر بینی موەکانی ریشی دەردەهێنێ ماڵوسامانە تیایدەبات بەدەستی خۆی.
*ئەگەر بینی سەروریشی بەیەکەوە تاشران ئەگەر نەخۆشبێ چاکدەبێتەوە، ئەگەر قەرزاربێ قەرزەکەی دەداتەوە، ئەگەر غەمباربێ غەموپەژارەی دەرەوێتەوە.
*ئەگەر بینی بەئەندازەیەك درێژبوە رێستی‌و کردی بەراخەرێك‌و فرۆشتی لەبازاردا گەواهی درۆ دەدات.
*ئەگەر بەچنگی ریشی گرت‌و چنگێ یان دووانی کێشکردو هیچ کەمینەکرد ماڵ‌و سامان‌و شکۆمەندی بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر کەمێکی لەریشی تاشی ماڵوسامانی بەئەندازەی ئەو برینە دەرِوات، ریش هەیبەت‌و سامە.
*دەگونجێت ریش بەلگەبێت خەڵات‌و جل‌وبەرگ‌و سوودو زیانی.
*ئەگەر بەزاری ریشی کورتکردەوە غەمو پەژارەی درێژە دەخایەنێت.
*ریش پشك‌و بەشەو بەلگەیە لەسەر راستگۆیی‌و درۆو رژدی‌و بەخشندەیی.
*دەگونجێت ریش بەلگەبێت لەسەر هاوسەر ، ئەگەر مووی سپی لەریشیدا

بینی دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئاگاداری ئەو هۆکارەی گرتویەتیەبەر.

*دەگونجێت ریش بەڵگەبێت لەسەر کشتوکاڵ، ئەگەر ریشی رەشی بینی سپیبوە بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونەوەی دورینەوەی کشتوکاڵەکەی.

*دەگونجێت سپیبوونی ریش بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشیو نەتوانین.

*ئەگەر لەکاتی بێداریدا ریشی سپیبوو لەخەودا بەرەشی بینی بەڵگەیە لەسەر چوستو چالاکیو سوربوونو توندی لەسەرجەم جموجوولەکاندا.

*ئەگەر ریشی بەپێچەوانەی خۆیەوە درێژبوو بەڵگەیە لەسەر گاڵتەو ئارەزوو ماڵوسامان بەفیرۆدان بەبێئەوەی جێی خۆی بگرێ یان غەمو پەژارە دایدەگرێ بۆئەوەی بەڵگەیە لەسەری.

*ریش بۆسەرپێچیکار تەوبەیە، ئەگەر وێڵو سەرگەردانبوو رێنومایی دەکرێ بەتایبەت ئەگەر سپێتی تێدابەدیکرد.

*ریشهاتن بۆ ژن خۆ نواندنە وەك پیاو یاخود سووکیو رسواییو ئەنجامدانی کاری نا بەجێیە.

*ریش بۆ منداڵ تەمەنێکی درێژە.

*ئالودەبوونی ریش یان ماچکردنی بەڵگەیە لەسەر کەمی توانا ئەگەر خەوبینەر مەبەستی هەبێت یان نە.

*بینینی ئەوەی بەرپێشدا دەنووسێ لەپوشو شتیتر قسەیەکی کاریگەری بەسوێیە یان دووگیانبوونی ژنە بەوەی کەنابێت ببێت.

**ریشاڵ (وشکەگیا)**: (نابلسی)دەڵێت: ریشاڵی دارخورما لەخەودا جلوبەرگە بۆ پیاووژنو بەڵگەیە لەسەر ماڵو سامانێکی بەنرخو بەها.

**ریشۆڵە**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکە سەفەر دەکات هەروەك کەو چونکە لەکاتی هەڵفریندا ناکەوێتەخوارەوە.

*هەروەها دەڵێن: پیاوێکی لاوازی خواناسو بەئارامەو نانو بژێوی حەلاڵە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی ریشۆڵەیەکی بەدەستهێنا پیاوێکی ئالەوچەشنە دەپێکێ.

*ئەگەر بینی لەگۆشتەکەیخوارد یان پەرەکانی هەڵکێشا خێروچاکە بەدەستدەهێنێت.

*دەگونجێت ریشۆڵە بەڵگەبێت لەسەر نەخشەو پلانکێشان لەکارەچاكو خراپەکاندا یان ئەوەی دەوڵەمەندو نەهەژارو نەرێزدارو نەسووکونزمە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر سووکایەتیو قەناعەتکردنو بەکەمترین

بــژێوی‌و ژیــن‌و ئاره‌زووبــه‌ده‌ركردن ، یـــاخود ده‌گونجێـــت نووســـه‌ر یـــا تۆماركاربێت.

(نابلسی) ده‌ڵێت: له‌خه‌ودا نووسه‌رێكی فـــه‌رمانڕه‌واو ده‌ســـته‌ڵاتداره، ریــشۆڵه‌ به‌ڵگه‌یـــه له‌ســـه‌ر كـــوڕێكی زیره‌كـــی زمـانڕه‌وان یـــاخود منــداڵێكی جــوان‌و خاوه‌ن دیمه‌نی سه‌رنج ڕاكێش.

**ریقنــه‌ی باڵنــده:** (نابلــسی) ده‌ڵێــت: به‌سه‌ر جل‌وبه‌رگه‌وه داپۆشه‌ره به‌هۆی بلاوبوونه‌وه‌ی به‌سه‌ریا.

*ریقنــه‌ی هــه‌ڵۆو داڵ به‌ڵگه‌یــه له‌ســه‌ر لابردنی پاشاو میره‌كان.

**ڕێ**

**رێبــاز( رێگــا ):** (ئـیبن سـیرین) ده‌ڵێـت: چوونه رێگه‌و رێبازێك چوونه ژێر ركێفی بازرگـــان یـــان فـــه‌رمانڕه‌وا یـــا پیشه‌وه‌رێكه‌وه‌یه.

*ئه‌گــه‌ر رێبــازێكی كــراوه ببینـــێ روو له‌كارو پیشه‌یه‌كده‌كات.

(نابلـسی)ده‌ڵێـت: رێبـاز له‌لێكدانـه‌وه‌دا وه‌ك ده‌رگاو ده‌روازه‌ی شاروایه، ئه‌گه‌ر له‌خه‌ودا رێبازێكی داخراوببینێ لـه‌رۆژدا ده‌گونجێت به‌ڵگه‌بێت له‌ســه‌ر رووداوێـك كه‌روویدات له‌وشاره‌دا.

*ده‌گونجێــت رێبــاز به‌ڵگــه‌بێت له‌ســه‌ر كیژه‌كه‌ی یان خانوو لانه‌ی.

**رێحانــه‌(گیـــای بۆنخـــۆش ):** (ئـــیبن ســـیرین) ده‌ڵێـــت: ئه‌گـــه‌ر رێحانـــه لێكرابــوه‌وه‌و لــه‌ت لــه‌تكرابوو به‌ڵگه‌یــه له‌سه‌ر غه‌م‌و په‌ژاره ، ئه‌گه‌ر به‌جێگیری بینـرا له‌شـوێنی خـۆی به‌ڵگه‌یـه له‌سـه‌ر پشوو هاوسه‌رو كوڕ.

*(عــه‌لی كــوڕی عوبه‌یــد) ده‌ڵێــت: لای (ســوفیان)ی (ســه‌وری) بــووم پیاوێــك وتــی: له‌خــه‌ودا بینـیم چڵه رێحانه‌یه‌ك به‌رزكرایــه‌وه بــۆ ئاسمــان لــه‌خۆرئاواوه هــه‌تا ونبــوو له‌ئاسمانــدا ، (ســوفیان) وتـــی: ئه‌گـــه‌ر خه‌ونه‌كـــه‌ت راســـتبێ (ئـــه‌وزاعی) مـــردوه، هـــه‌ر ئه‌وشـــه‌وه به‌مردووی چوونه‌سه‌ر ته‌رمه‌كه‌ی.

*رێحانـه به‌ڵگه‌یـه له‌سـه‌ر كـوڕ ئه‌گـه‌ر له‌بێستان روابێ.

*به‌ڵگه‌یــه له‌ســه‌ر ژن ئه‌گــه‌ر چــه‌پك‌و گورزه‌بێت.

*به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر به‌ڵاو نه‌هامه‌تی ئه‌گه‌ر لێكرابــوه‌وه‌و فرێــدرابوو له‌شــوێنێكیتر یان بۆنی نه‌بوو.

*هــه‌روه‌ها ده‌ڵێن (رێحانــه) نیعمه‌تــه به‌پێی ئایه‌تی: ﴿ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ ﴾ (الواقعة: ٨٩).

(نابلـــسی) ده‌ڵێـــت: رێحانـــه جیـــاوازه له‌خه‌ودا به‌گوێره‌ی بۆن‌و به‌رام‌و گرتنی به‌ده‌ســـته‌وه بـــۆ بۆنكردنیـــان‌و بینینـــی به‌ڵگه‌یــه له‌ســه‌ر ره‌واندنه‌وه‌ی غــه‌م‌و

پەژارەو کرداری چاکەو بەڵێنی راستو دروست.
*ئەگەر مردوو ڕێحانەیدایە یاخود ڕێحانەی پێبینی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەلەبەهەشتدایە.
*ڕێحانە بۆ رەبن هاوسەرەکەیەتیو بۆ مێرد کورە، یاخود زانیارییەکە پێی دەناسرێت یا پیاهەڵدانێکی جوانە.
*دەگونجێت بینینی ڕێحانە لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی چونکە بۆ نەخۆش هەڵدەگیرێ.
*یەکانگیری ئاوو سەوزایی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رەوینەوەی غەمو پەژارە.
*هەموو ڕێحانەیەك بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونەوەی وادەی مەرگ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەرکەوتنی نرخ.
*ئەگەر ڕێحانە لەشوێنی خۆی جێگیربوو باسو خواسێکی باشە لەگەڵ قسەیەکی کەم.
*ئارەقی ڕێحانە کورە.
*ئەوەی تاجەگوڵینەی ڕێحانە بەسەری خۆیەوە ببینێ لەکاردەخرێ، ئەگەر دەستەلاتداربێ .

*ڕێحانەفرۆش خاوەن غەمو پەژارەیە چونکە نامێنێتەوە.
*ڕێحانە ژنی جوانو شۆخو شەنگەو بۆنوبەرامی خۆشیەویستیەتی بۆیو سەرسامی پێی بژێویەتی بۆی.
*ئەگەر ڕێحانە لەماڵێکدا بلاوبوەوە بەباشی باسیدەکەن.
*ئەگەر ڕێحانەیان دایە بەلام بۆنی نەبوو بەلاو نەهامەتییە.
*ئەگەر مرۆڤێك ڕێحانەی گرتە یەکێکیدیو ئەوی بەرانبەر گرتیەوە لەنێویاندا غەمو پەژارە دەکەوێتەوە.
*ئەگەر بینی یەکێکیتر دانیشتوە لەمزگەوتو لەدەوری ڕێحانە غەیبەتو باسیەتی بەشێوەیەك کەوانییە.
**ڕێحانەفرۆش:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی ئارامگرە لەسەر بەلاو نەهامەتیو رازییە بەچارەنووسی خوایی.
**ڕێزمان( نحو ):** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر رەفتاری باش.
**ڕێزمانەوان ( نحوی ):** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جوانکاری لەقسەو وتەدا.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر:
+شەڕ.
+لێدان.
+وتی وتی.

+هورووژان.
*ئەگەر بینی بوە بەزوبانزان ئەگەر لەوانەبوو کەقسەی ساختەیان ڕێکدەخست ڕاستگۆ دەبیٚو بەوە دەناسریٚ، ئەگەر بێباوەڕبوو موسولْماندەبێت ، ئەگەر سەرپێچیکاربوو تەوبەدەکاتو دەگەڕێتەوە بۆلای خودا، ئەگەر پیتێك بەزوبانیدا نەدەهات وەك (تا)و (فا)و یا(ثاء) یا پیتێکی بەپیتێکیتر دەگۆڕی یان قووتیدەدا یاخود لالْبوو یاکەڕو لەخەودابینی بوە بەرێزمانزان یاخود بەئاسانی دەدویٚو قسەلەزاری دێتە دەرەوە بەلْگەیە لەسەر دەولْەمەندی دوای هەژاریو پارێزگاری لەنەخۆشیو قوتاربوون لەناڕەحەتی.

**ڕێسەر( بادەر):** (نابلسی) دەلْێت: ڕێسەری خوری لەژنو پیاو لەخەودا بەلْگەیە لەسەر ئەوەی لەسەفەردایە چونکە تەشی ڕێسان بەلْگەیە لەسەر سەفەر.
*ئەگەر بینی بوە بەرێسەرێك حالْی لەبارێکەوە دەگۆڕیٚ بۆ بارێکیتر.
(ئیبن سیرین) دەلْێت: ڕێسەر گەشتیارە ، دەگونجێت بەلْگەبێت لەسەر ئەوەی کاروبار دەبەستیٚو هەلْوسکەوت بەهۆکارەکانەوە دەکات وەك فەتواگەرو دادوەرو خاوەندارو بۆچوون.
*ئەگەر لەخەودا پەتێکی بادا سەفەردەکات ، ئەگەر لەسەفەرکارانبوو سەفەرناکات ، ئەگەر پیشەکەی بەوچەشنەبێت کاروبارێکی تۆکمەو بەهێزدەکات.
*ئەگەر لەکاتی بێداریدا کارێك لەژێردەستی ئەودابیٚ یاخود ئامادەی دەکات بەشەریکایەتی یان هاوسەرگیری یاخود پەیمانبەستن یان ڕێککەوتن.
(نابلسی) دەلْێت: لەخەودا بینینی بەلْگەیە لەسەر پلانو فێلْو جادوو.
*دەگونجێت بینینی بەلْگەبێت لەسەر کوڕانو یا بینینی بەلْگەبێت لەسەر ئاسانکردنی کاروبارو هاوسەرگیری بۆ ڕەبەن.

**ڕێکخستنی کاروبار:** (نابلسی)دەلْێت: پلانو نەخشەی بەندە لەخەودا بەلْگەیە لەسەر نزیکی دەرولێکردنەوە ، ئەگەر لەناڕەحەتیدابوو، ئەگەر قەرزاربوو لەوەدا دەبێت بیداتەوە.

**ڕێکخەرو بەستەر:** (نابلسی)دەلْێت: کەسێکە شتومەك ڕێکدەخات بینینی بەلْگەیە لەسەر:

+ماڵو سامان کۆکردنەوەو رژدیو بەخیلیکردن تێیدا.

+سووربوونو بەردەوامی لەسەر وەرگرتنی زانیاریو زانست.

**رێگرتن(نەهێشتن):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر بێباوەڕی.

**رێگوزاری چیا:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر مردنو ژیان.

**رێگە (رێباز):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: رێگە ئاینو جێگیربوونە بۆ یەکێك بیگرێتەبەرو شەقامەرێی ئیسلامەو رێبازی ئاینو شەریعەتەو دەستی دەگرێ بەرێبازو هۆکاری پتەوی حەقەوە.

*ئەگەر رێگەی ونکرد دوودڵە لەکاروباری خۆیو ئاینەکەیدا.

*ئەگەر بەرێکی رۆیشت بەسە رێگەدا لەسەر حەقە، ئەگەر دنیاگەربوو رێنومایی دەکرێت بۆ بازرگانیەکی بەسوودو قازانج.

*رێگەی وێڵو سەرگەدان وێڵیو سەرگەردانییە بۆ خاوەنەکەی، ئەگەر داواخوازی رێنماییی بوو دەگەڕێتەوە بۆ حەقو راستی.

*رێگەی نادیارو ون لەخۆباییبوونو بیدعەیە.

*رێگەی خوارو خێچ لەمەزهەبو کرداردا دەبێت.

*(ئەبو موسای ئەشعەری) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: لەخەودا بینیم کۆمەڵە رێگەیەکی زۆرم لەبەردایە هەموو تیاچوو بەتەنیا یەك رێگە مایەوەو گرتمەبەر هەتا گەیشتم بەچیایەكو بینیم پێغەمبەر (ﷺ) لەسەریەتیو لەپاڵیا (ئەبوبەکر)(رەزای خوای لێبێت)وەستاوە، وتم: هەموو هی خوداینو بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە .

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا شەرعە، رێگەی جیاواز جیاوازو بیدعەیە، ئەگەر بینی بەو رێگەیەدا ناڕوات لەسەر وێڵیو سەرگەردانییە.

*ئەگەر رێگەی لێتێکداو شتومەکەکەیبرد دەکەوێت لەهاوڕێیەكو رێگەی دەستەلاتدار رێگەیەکی ناخۆشە، ئەمەش دادپەوەرییە بلاویدەکاتەوەو تەوبە دەکات، ئەگەر بێباوەڕبوو رێنومایی وەردەگرێ.

*رێگەی جیاواز جیاواز بەڵگەیە لەسەر دوودڵیو گومان.

*رێگەی گوماناوی رێگەیەکە مەردوم دەبات بۆ سەرگەردانیو بیدعەو بێباوەڕی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+رێگەی دەریا.

+قوتاربوونە لەناڕەحەتی.
+ڕێگەی پارەپەیداکردنی حەلاڵە.
+ڕێگەی ڕاستە کەئەگەر مرۆڤ شوێنی بکەوێت قوتارو سەرفرازدەبێ.
**ڕێگەی نێو چیا:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی ڕێگەو کەلێنی نێو چیا بەڵگەیە لەسەر قوتاربوون لەناڕەحەتی یاخود سەفەر بەپێی ئایەتی: ﴿ وَاللهُ جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ بِسَاطًا (١٩) لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلاً فِجَاجًا (٢٠) ﴾ (نوح).
**ڕێ لێگیران:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی ڕێگەی لێبگیرێ‌و ماڵ‌و سامانی تالان بکرێ مرۆڤێکی خۆشەویستی دەڕوات.
**ڕێواس:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا سوودو قازانجە لەلایەن خزمێك یاخود هاوڕێیەکەوە ئەگەر خۆشبوو، ئەگەر مزربوو پەشیمانییە.
**ڕێوی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ڕێوی پیاوێکی ستەمکاری قوڵبڕەو جێگیرنابێ لەسەر کاروباری دیناو ئاین.
*ئەگەربینی ڕێویەك کێبەرکێی لەگەڵدەکات نەیارێکە.
*ئەگەربینی زۆرانبازیو بەربەرەکانی لەگەڵ ڕێویەکدەکات لەگەڵ کەسێکی نزیك‌و خزمێکی بەربەرەکانیدەکات.
*ئەگەر داوای ڕێویکرد دەردو نەهامەتی روو لەهاوسەرەکەیدەکات، ئەگەر ڕێویش هات بۆی ترس‌وبیم رووی تێدەکات، چوونەلای ڕێویش چوونەلای ژنێکە کەمێك خۆشی دەوێت.
*ئەگەر شیری ڕێوییەکی خوارد لەنەخۆشی چاکدەبێتەوە ، وەگەرنا لەغەم‌و پەژارە قوتار دەبێت.
*وتراویشە: ئەگەر ڕێویەکی بینی سووکی‌و نزمی رووی تێدەکات‌و ماڵ‌و داراییەکەشی کەمدەکات.
*هەندێکدەڵێن: ڕێوی پزیشك یان فاڵچی ئەستێرەگەرە.
*ئەگەربینی دەستدەدات لەڕێویەك ترس‌وبیم لەجنۆکەو دەستلێوەشاندنی دێت بەسەریا.
*خواردنی گۆشتی ڕێوی نەخۆشییەکە زوو چاکدەبێتەوە لێی.
*هەڵگرتن‌و بردنی ڕێوی سەرکەوتنە بەسەر نەیارو دوژمندا.
*ئەگەر یاری لەگەڵ ڕێوی بکات ژنێکی جوانی پێدەبەخشرێ‌و هەردووکیان یەکتریان خۆشدەوێت.
*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئەبوبەکر)ی (سدیق)(رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: لەخەودا بینیم راوڕاوێنم لەگەڵ ڕێویەك دەکرد (ئەبوبەکر)یش وتی: تۆپیاوێکی درۆزنی.
*پیاوێك هات بۆلای (ئیبن سیرین)و وتی: لەخەودا بینیم باشترین پاداشتی

ڕێویم دایەوە ، ئەویش وتی: پاداشتی یەکێکداوەتەوە شایستە نییە، لەخوابترسە تۆ پیاوێکی درۆزنی.

*(مەجوس)دەڵێت: (ضحاك)لەخەودا بینی وەك ئەوەی نێوانی رۆژهەلاتو رۆژئاوا پڕبووو لەڕێویو خۆشی شوانیانبوو، خەوەکەی بۆ راڤەکارێکی خەو گێڕایەوە، ئەویش وتی: سیحرو فڕوفێڵ زۆر دەبێت لەسەردەمی تۆدا. ئەم لێکدانەوەیەش لەجێی خۆیدابوو.

(نابلسی)دەڵێت: ڕێوی بەفالگرو رمڵلێدەرو پزیشكو خەڵکی پلاندانەر راڤەدەکرێت، ئەگەر بینی ڕێویەك دەکوژێت ژنێکی بەڕێزو داوێنپاکی دەستدەکەوێت یاخود پیاوێکی قۆڵبڕو ناپاك رووپامایی بۆدەکات، هەروەها ڕێوی بەڵگەیە لەسەر دوژمنێکی نادیاری فڕوفێڵاوی کارو کردەوەی خۆی لەکاتی خۆیدا ناکات ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ژنی ناپاك.

*ئەگەر بینی راراوێن لەگەڵ ڕێویەك دەکاتو عەورەتی قووتدەدات ژنەکەی زیناو داوێنپیسکردووە.

*ئەگەربینی لەپێستی ڕێوی شتێکی دروستکردوە هێزو سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت، دەگونجێت میرات بێت لەلایەن ژنەوە.

*بینینی ڕێوی بەڵگەیەلەسەر:

+سوودو قازانج.

+ژن.

+هاوسەرگیری بۆکەسی رەبەن.

# زا

## زا

**زار( دەم ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: یاریکردن بەزار جیاوازی هەیە لەبارەیەوە، وتراویشە: ڕۆچوونە لەسەرپێچیدا ، یاخود بازرگانییە لەکار خراپدا.

*یاریکردن پێی بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی کوشتار.

(نابلسی)دەڵێت: بەرزی‌و بڵندی‌و پلەوپایەو شکۆمەندییە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی لەکاتی بێداریدا دەیکات لەگاڵتەو سووکایەتی. دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خراپەکار.

*هەروەها وتراوە: یاریکردن بەهەمووشتێك فێڵەو بەزار بازرگانی‌و سەرپێچییە.

*زار کارێکی پووچ‌و بەتاڵە ، ئەگەربینی یاری پێناکات بێکارن‌و لەسەر حەق نین، ئەگەر یاری پێکرد بێکارن لادەبرێن‌و لەسەر حەق نین ، ئەگەریاری پێکرد دەستەلاتدارن ستەم ئەنجامدەدەن یاخود یاخی‌و دەستدرێژیکارن.

*ئەگەر بینی یاری بەزار دەکات بەڵگەیە لەسەر شەڕو ئاژاوە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: زارو دەروازەو دەستپێکی هەمووکارو بارێکەو کۆتاییەکەشیەتی.

*ئەگەر بینی شتێك لەزاری هاتەدەرەوە بەڵگەیە لەسەر ڕزق‌و ڕۆزی خێر یان شەڕ.

*ئەگەر بینی زاری هەڵواسرابوو یان داخرابوو خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر بێباوەڕی.

*ئەگەر بینی زاری پڕبوە لەناو هەتا هیچ شوێنێکی تێدا نەما نەمانی ڕزق‌و ڕۆزییەتی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کلیلی کاروباری خاوەنەکەیەتی یاخود کۆتاییەکەیەتی لەگەڵ چاکی‌و خراپی دەروازەی ڕزق‌و ڕۆزی‌و کاروبارەکانی.

* زار بەڵگەیە لەسەر:
+مردن و ژیان.
+وتەوقسە.
+ماڵ و لانە.
+شاوڵ.
+دەفرو قاپ.
+زیندان.
+حەمام.
+ئاش.
+سندووق.
+هاوسەر.
+بەلووعە.
+داواو تیابەر.
+شوێنی بەندایەتی.
+رزق و رۆزی.
+پیشەسازی.
+رێنومایی و سەرگەردانی.
* ئەگەر زاری بینی گەورەبوەو باشبوە بەڵگەیە لەسەر سەلامەتی و ژیانی، ئەگەر پیشەکەی بانگکردن و چاودێریبوو.
* ئەگەر بینی بێ دەم و زارە بەڵگەیە لەسەر وەستانی حاڵ و باری بەپێچەوانەشەوە.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر وێرانبوونی ماڵ و لانەو شکانی دەفرو بەتاڵبوونی زیندان.
* ئەگەر زار بەڵگەبوو لەسەر حەمام تفەکەی ئاوەو زوبانی وەك بەخێوکاری وایە.
* ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر ئاش شاوڵ پاکێشانەیە.
* دەگونجێت زار بەڵگەبێت لەسەر دەمی بیرو سندووق و مەشکە.
* زار لانەی خزمایەتییەو دەڵێن: عەورەتی ژنێکە منداڵی نابێت یاخود ئاگردانێکی دوکەڵاوییەو بۆ ئەوەی لەسەفەردایە سەفەرەو کونە مارە.
* تفولیکی ژنی جوان پەرداخی بادەیە یان هەنگوین یاخود قسەو وتەیەکی باشەو پرژاندنی مارەبڕینە.
* تفولیکی پیر مژینی لیمۆیە یان بیرێکی بۆگەنە یاخود پێوەدان یا خەرتەلەیە، دەگونجێت ناتوانایی بێت لەبەجێهێنانی کاروباردا.
**زافەران:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: زافەران پیاهەڵدانێکی باشە، ئەگەر نغاوی نەبات، شێلان و نەخۆشییە.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیاهەڵدان و باسکردنی باش، ئەگەر رەنگەکەی کاریگەری نەبێت بۆسەر لەش ولارو جل وبەرگ، ئەگەر کاریگەری هەبوو نەخۆشییە بۆیەکێك ببیهارێ و بیشێلێ.

*هەروەها دەڵێن: زافەران بۆنیخۆشە بەمەرجێ بەرلەشو لاری بینەری نەکەوێ، ئەگەر بینی زافەرانی شێلا کارێك ئەنجامدەدات پێی سەرسام دەبێت و دوای ئەوکارە نەخۆشدەکەوێ.

**زاڵبوون( سەرکەوتن ):** لەخەودا ئەگەر زۆربوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خۆشیو رقو قین دەهێنێت.

*زاڵبوون بەڵگەیە لەسەر شکانی دوژمن.

**زانا( شارەزا ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی زاناو شارەزایە وتەی لێوەردەگیرێو تاقیدەکرێتەوە سکالا لای خەڵکیدەکاتو لێی وەردەگرن.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زیرەکی بێداریو زانیاریو شارەزایی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرئەوەی ناخی مرۆڤ سارێژدەکات بەزانیاریو هەڵسوکەوتی.

*ئەگەر خەوبینەر سەرپێچیکاربوو تەوبە دەکات بۆ لای خودا، ئەگەر سەرپێچکارنەبوو رێنومایی دەکرێ، ئەگەر بێباوەڕبوو موسوڵماندەبێ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: "یەکێك خوداوەند تووشی خێری بکات شارەزای دەکات لەئاییندا"[1].

*ئەگەر ئەوکەسە (شافعی)مەزهەببوو لەخەودا مەزهەبی گۆڕی بەهانە دەهێنێت یان قەرزدەکات یاخود سارد دەبێتەوە لەپەیمانو بەڵێنی یاخود دەبێت بەخاوەنی فیتنەو دووڕوویی لەبۆ مامۆستاکەی یان لەشوێنێکەوە دەچێت بۆ شوێنێکیتر یان لەهاوسەرێکەوە بۆ یەکێکی دی.

**زانایانی پێشینو دواینی ئیسلام:**

(ئیبن سیرین) دەڵێت: زانا پزیشکەو ئەوەی یاددەخاتەوە ئامۆژگاریدەرە بەپێی ئایەتی: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَىٰ تَنْفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (الذاريات: ٥٥).

*ئەگەر بینی یاد دەخاتەوەو خۆشی لەوانە نییە غەمو پەژارەو نەخۆشیەو دوعا دەکات چارەسەری بدات.

*ئەگەر بەدانایی دواو هاتەگۆ چاکدەبێتەوەو قەرزەکەی دەداتەوە، ئەگەر قەرزاربوو سەردەکەوێ بەسەر ستەمکاراندا.

---

[1] (بوخاری) لە (كتاب العلم) فەرموودەی ژمارە (٧١)داهێناویەتیو(مسلم) لە(الامارة) فەرموودەی ژمارە (١٧٥) دا لەفەرموودەی (معاوية) ی کوڕی (ئەبو سوفیان)ەوە( ڕەزای خوای لێبێت).

*ئەگـــەر قـــسەیەکی نـــاقۆلایکرد کاروبارەکـانی لەسـەر قورسـدەبن‌و دەبێـت بەمایـەی رابـواردن‌و پێکـەنین بـەپێی ئایـەتی: ﴿فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ﴾ (القصص: ٢٥).

*ئەگـەر بازرگانێـك بینـی قوتاردەبێـت لـــەزیان‌و ئەگـــەر لەشـــوێنێکی یادکردنـەوەدا یـادو قورئـان خوێنـدنی بینـی لەگـەڵ دوعـاو وتنـی هـۆنراوەی ئـاینی ئـەو جێگـەو شـوێنە بەباشـی ئاوەداندەکرێتـەوە بـەپێی راسـتی خوێندنەوەکـە، ئەگـەر لـەقورئان خوێندنەکەدا هەڵـە هـەبوو ئاوەدانییـەو تـەواو نـاکرێ، ئەگـەر هـۆنراوەی پیاهەڵـدانی وت دەسـتەلاتێکی پـووچ‌و بەتاڵە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینـی مژدەیـە بەبەرزکردنـەوەی پلەوپایـەو پیاهەڵـدانی بـاش‌و ئەنجامـدانی کـردار بەوەی دەیزانێ.

*بینینـی زانـا یـان زیـادبوونی زانـستی خەوبینـــەرە چـــونکە ئـــەوان ئامۆژگاریکـاری خوداوەنـدن لەسـەر زەوی، هـــەروەها دانایـــانیش بـــەو چەشـــنەن‌و زیـــادبوونی ئامۆژگـــاری خۆشی‌و شادییە.

*بینینـــی پیاوچـاکان چـاکی ئاینـە، ئەگەر بینـی بـوە بەزانایەکی شـارەزاو وتـــەکانی وەردەگـــرێ‌و هەندێکیـــشی وەرناگیرێ تاقیدەکرێتەوە بەلایەك‌و بۆ خـــەڵکی باســـدەکات‌و وتـــەکانی وەردەگرن.

*ئەگـەر یـەکێك لـەزانایانی پێـشینی لەشوێنێکدا بینـی خـەڵکی ئـەو شـوێنە ئەگەر لەغەم‌و پەژارەوە نەبوونیدا بوون پەروەردگار دەروویان لێدەکاتەوە.

*ئەگـــەر زانایـــەکی نادیـــاری بینـــی پزیشکێکی فەیلەسوفەو دەچێتە ئـەو شوێنەی کەبینیویەتی.

**زانـــای کۆمـــەڵ‌و نەتـەوەیـەك:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: کەسـێکی خـاوەن بیدعەیە.

(نابلـسی) دەڵێـت: پیاوێکـە خـەڵکی دەخاتـە سەرچـاکە گەرچـی خـۆی خاوەنی بیدعەیە.

**زانیـــاری( زانـــست ):** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـــت: زانیـــاری پەیوەندیکردنـــە بەهەنـدێك لەگـەورە پیاوانـەوە، ئەگـەر بینـــی زانیـــاری بەدەســـتهێنا ، هاوسـەرگیری لەگـەڵ کەسـێکی زانـادا دەکات.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر ناوێکی دیـارنرا لەخـەوداو بـانگکراپێی مـژدەو باسـی

چاك‌و رێنومایییە بەزانیاری یان بڵاوكردنەوەی.

*بوونی زانیاری دەربارەی خوداوەند یا سوننەت بۆیەكێك بێئاگابێت لێی بەڵگەیە لەسەر سۆزو بەزەیی خوایی.

*ئەگەر فێری جادوبوو یان هاوچەشنی ئەوە بەڵگەیە لەسەر بیدعەو سەرگەردانی.

**زاوا:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بۆیەكێك زاوای نەبێت لەبێداریدا بەڵگەیە لەسەر سەركەوتن بەسەر دوژمناندا.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی لەترس‌و بیم.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا رازێنرابوەوە دنیایەكی بەفەرپییتە.

*ئەگەر بینی زاوایە بەڵام ژنەكەی نەبینی‌و نەیناسی‌و بۆی دیارینەكرا یا دەمرێ یان مرۆڤێك تیادەبات.

*ئەگەر بووكەكەو هاوسەری داهاتووی دیاریكردو ناسی وەك هاوسەرگیری وایە.

*ئەگەر بینی هاوسەریگرتوە پلەوپایە بەئەندازەی ئەو ژنەو رێزو مانای ناووجوانی بەدەستدەهێنێ.

**زب**

**زبر:** جلوبەرگی زبرو خواردنی رەق یان قسەی زبرو رەقە ، لەخەودا بۆ خاوەنی ماڵ‌و دارایی بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی پلەوپایەو گۆڕانی حاڵ‌و باریان لەگەڵ كەمبوونەوەی رزق‌و رۆزییان مەگەر كاریكاتە سەر چاكەكانیان ئەوجا بەڵگەیە لەسەر خۆبەكەمزانین‌و قەناعەت‌و سەلامەتی بیرو بۆچوونیان ، ئەگەر كاریگەری نەبوو لەسەر بەڵگەیە لەسەر سزاو خەشم‌و تۆڵەی خوایی بۆیان، قسەی زبرو رەقیش لەیەكجیابوونەوەی دووڵدارو خۆشەویست.

**زبڵ( پەیین ، پاشەڕۆ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵێكە بۆ یەكێك بیخوات یان بیگرێتەخۆ.

*زبڵ ماڵێكە دەخورێ.

*پەینی بەسوود رزق‌و رۆزییە بەتایبەت ئەگەر وشكبوو.

*زۆری پاشەڕۆی خەڵكی بەڵگەیە لەسەر رێگرتن لەجموجووڵ‌و بزاوت.

*رووكردنەكاری زیانبەخش‌و پیسبوون بەپاشەڕۆی خەڵكی‌و كەوتنەوەی نەخۆشی‌و ترس‌وبیم بەڵگەی چاكەو خێرە بۆ یەكێك كردارەكانی ناقۆڵابن.

*پاشەڕۆی مانگا بەڵگەی خێرە بۆ جووتیارو ئەوانەی سوودی لێوەردەگرن بەدەر لەخەڵکیتر[1].

*ئەگەر گسکی ماڵەکەیداو نەخۆشێکی تێدابوو دەمرێت، ئەگەر ماڵودارایی هەبوو لەکیسیدەچێت ، ئەگەر شوێنێکی گسکداو خۆڵو پیسییەکەی کۆکردەوە لەگەڵ خاکو خۆڵەکەی سوود لەگوندو لادێ وەردەگرێت ئەگەر هی ئەوبوو، وەگەرنا دەبێت بەباجگر یا هەژار دەکەوێتو دەست لەخەڵکی پاندەکاتەوە.

**زبلوخۆڵ:** لەخەودا بەڵگەی چاکو باشییە بۆ هەژاران لەبەرئەوەی کۆمەڵێك شتی کۆکراوەو پاشەڕۆیەو بۆ دەوڵەمەند باش نییە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵو سامان ، یان کاڵاوشتومەکی جۆراوجۆری بۆبێت.

**زر**

**زراو:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی لەخەودا زراوی بەددانی بڕا رقو قینێکی توندی لێدەبێ.

*ئەگەر خوێنی لێهاتو بەرەخواردیەوە ماڵی حەڵاڵو کرێیە بەنەزانینو شەڕ بەدەستدێت.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر توورەییو چێژو پێکەنینو ئامرازی بەکارهاتوو.

*زراوی مرۆڤ خاوەن نهێنییە.

**زریزە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی گوناهی گەورەو مەزن بەپێی ئایەتی: ﴿ اَنّا اَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَ ﴾ (الإنسان: ٤).

*زریزە لەملی پیاودا هاوسەرگیرییە لەگەڵ ژنێکی بەدرەوشتدا .

*ئەگەر بەزریزەیەك ببەسترێتەوە بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە تێدا دەژی یاخود لەئایندەدا تووشی غەمو پەژارە دەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ژنی تەمەن کورت ماڵو سامانی هەمیشە حەڵاڵە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەڕەشەو توورەبوون.

*ئەگەر زریزەی (کیسرا)ببینێو ستەمی لێکرابێ سەردەکەوێ.

*هەروەها زریزەی (کیسرا)بەڵگەیە لەسەر دوژمنی پادشا لەوڵاتەکەی دەبینرێ.

هەروەها (ئیبن سیرین) دەڵێت: زریزە لەگەردنی پیاودا ئەگەر ئەوکەسە قورئانخوێنبوو کۆیدەکاتەوە، ئەگەر خوازیاری فیقەبوو زانیاری پتەوتر

[1] گوتەی (ئیبن سیرین)ە.

دەکات، ئەگەر بەڵێنێك لەئەستۆیدابوو بەجێیدەگەیەنێت، ئەگەر هیچکام لەوانەنەبوو ئەوکەسە رەبەنبوو ژنێکی قورئانخوێن دەکات بەهاوسەری خۆی، ئەگەر ژنبوو دووگیانبوو کوڕیدەبێت، ئەگەر بەڵێنێك لەئەستۆیدابوو بەجێی ناهێنێت.

*ئەگەر قورئانی لەبەربوو لەبیریدەکات و بێئاگادەبێت لێی، وەگەرنا زانیاریەکانی پەرت پەرت و بێکەڵکدەبێت.

*ئەگەر وایەری کۆکردەوە شتی دەگمەن و گەوهەری قورئانەو زومورودیش سوننەتەو سەرجەم دانایی و گوتەی چاك فیقە.

*زریزەی ژن مێردەکەی یان کوڕەکەیەتی.

*ملوانکەی ئەڵماس بەلگەیە لەسەر باوەڕو زانیاری و قورئان.

(نابلسی) دەڵێت: ملوانکەو زریزەی گەوهەر لەخەودا بۆ ژن جوانی و شۆخوشەنگیانە، ملوانکەیەکی هۆنراو لەگەوهەرو ئەڵماس خواناسی و ترسان و لەبەرکردنی قورئانە بەپێی پاکی و دەنکەکانی و زۆرییان.

*گەوهەر ملوانکەدا کرۆکی کارو کۆتاییەتی.

*ئەگەر بینی ملوانکەیەکی زومورود یان دوانی لەملدایە لەلێکدانەوەو راڤەدا وتەی خوداوەندە یان قسەی باشە، یاخود دەبێت بەهەڵگرانی قورئانی پیرۆزو ئەمانەتپارێزی و خواناسی و چاکە لەئاییندا رووی تێدەکات بەئەندازەی ملوانکەو روونـاکی و درەوشاوەیی لەگەردنیدا یاخود دەگونجێت ئەسپەردەیەك یا بەڵێنێك لەئەستۆیدابێت.

*ئەگەر بینی ملوانکەو زریزەی زۆری لەملدابوو نەیدەتوانی هەڵیبگرێ لاوازدەبێت لەکارکردنی بەزانیارییەکەی و بەجێهێنانیدا لاوازدەبێ.

*ئەگەر ژنێك بینی ملوانکەو زریزەیەکی لەمدایە باشی و خراپی دەگەڕێتەوە بۆ مێردەکەی و بژێوی پەیداکاری یان ئەوەی ئەمانەتی پێدەسپێردرێ.

## زڕ

**زڕەدار**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: زڕەدار پیاوێکی خراپی ناقۆڵایەو سەرقاڵی کاروباری دنیایە.

## زف

**زفت( قیر )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: قیر پارێزگاریی و خۆپارێزییە لەکاری مەترسیدار.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پەردەو قەڵغانو پارێزگارییە لەگەرماو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سیفەتی ناوەکەی خۆی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵو دارایی چونکە (ئیبن سیرین) هەموو رەشییەکی بەماڵداناوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سوودو تەوبە هەروەك چۆن (خەڵوز)و (ئەبەنووس)بەوچەشنە لێکدرایەوە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر جێگیربوون بەپێی وتەی ڤیرکراوو ناگۆڕێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کەشتیو نەخشو نیگار.

## زل

**زللە( شەقازلە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی زللەی لەمرۆڤێکدا ئامۆژگاریدەکاتو رێگری لێدەکات لەبێئاگایی.

(نابلسی)دەڵێت: سوودو قازانجە ، زللە لەخۆدانی ژن بەڵگەو مژدەیە بەبوونی کور دوای نائومێدبوون ، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ ، فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ﴾ (الذاريات:٢٨ـ ٢٩).

*زللە ستەمێکە زللەوەشێن دەیکات بەرانبەر کەسێك خراپ نەبوە بۆی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گوناو کوڵم یان هەر ئەندامێکی تری لاشەو بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی.

**زلوبیا**[1] : (ئیبن سیرین) دەڵێت: قوتاربوونە لەغەمو پەژارەو ماڵو دارایی و خۆشحاڵییە.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ئاهو پەشیمانی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شاییو پەشیمانی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئاهەنگو شایی.

**زلوبیاساز:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر مژدە بەقوتاربون لەناخۆشیو چورتم.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو نارەحەتی.

## زم

**زمانگیرانو لاڵی مرۆڤ:**

(نابلسی)دەڵێت: زمانگیرانو لاڵی مرۆڤ لەخەودا رەوانبێژیو شارەزاییە لەفیقدا بۆ خەوبینەر یاخود پلەوپایەو سەرکەوتنە بەسەر دوژمنایەتیدا.

---

[1] **زلوبیا:** جۆرە شیرینییەکە. (وەرگێڕ)

**زمانەچكۆلە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی زمانەچكۆلەی زیادیكردوە بەڕادەیەك خەریكە گەرووی دەگرێ خەونەكەی بەڵگەیەلەسەر سووربوونی لەسەر كۆكردنەوەی ماڵوگرتنی ماڵوسامان لەخۆیو مەرگو چارەنووسیشی نزیكبوەتەوە.

**زمرود**[1] : (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گەواهیدانو ئەوەی مرۆڤ دەگەیەنێت بەكۆشكەكانی بەهەشت.

*ئەگەر بینی زومڕودی بەدەستهێنا برایەكی چاك بەدەستدەهێنێت یاخود منداڵی نێرینەی رەوشت بەرز یا زانیارییەكی بەسوود یان ماڵێكی حەلاڵی چاكوباش.

**زو**

**زوبان:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: زوبان وەرگێڕو كار ڕێكخەرو بەجێهێنەری داواكانی دڵوئەندامەكانی مرۆڤە لەچاكەو خراپە.

*ئەگەر زوباندرێژی یاكورتی بەسەرداهات هێزو زاڵبوونە.

*ئەگەر بینی زوبانێكی درێژی هەیە نەك بۆ بەربەرەكانیو شەڕ بەڵگەیە لەسەر پیسی زوبانیو جنێوفرۆشی.

*دەگونجێت زوباندرێژی سەركەوتنی خاوەنەكەی بێت لەرەوانبێژیدا لەگەڵ ئەدەبو ئامۆژگاری.

*ئەگەر پێشەوایەك بینی زوبانی درێژبوە چەكی زۆردەبێو بەڵگەیە لەسەرئەوەی ماڵوسامان بەدەست دەهێنێت بەهۆی وەرگێڕەكەیەوە.

*زوبانی بەستراو لەلێكدانەوەدا هەژاریو بەڵگەی نەخۆشییە.

*ئەگەر بینی موویەكی رەش لەسەر زوبانی هاتوە شەڕێكی كتوپڕی خێرایە، ئەگەر موویەكی سپیبوو شەڕێكە لەدواییدا بەسەریا دێت.

*ئەگەر بینی دوو زوبانی هەیە زانیاری پێدەبەخشرێو بەڵگەی پتری دەبێتو زاڵدەبێ بەسەر دوژمنانیدا.

*هەروەها دەڵێن: زوبانی ئاسایی بێگرێ لەدەمدا بۆسەرجەم خەڵكی باشە.

*ئەگەر بینی زوبانی درزیبردوەو ناتوانێ بدوێ قسەیەكدەكات دەبێت بەبەلا بەسەریەوە بەمەش زیانی دەستگیر دەبێ بەئەندازەی ئەو زیانە.

هەروەها بەڵگەیە لەسەرئەوەی درۆدەكاتو ئەگەر بازرگانبوو زەرەر دەكات ، ئەگەر فەرمانڕەوابوو لادەبرێ.

---

[1] **زمرود:** بەردێكی بەنرخە. (وەرگێڕ)

*ئەگەر بینی لایەکی زوبانی پچڕاوە ناتوانێ لەکاتی لێدوانیدا بەڵگەکانی تەواو بخاتە روو ، ئەگەر لەگەواهیدارانبوو لەشایەتیدا راستناکات یان گەواهیو شەهادەی وەرناگیرێ.
*هەندێکدەڵێن: ئەگەربینی زوبانی پچڕاوە دانا دەبێت.
*ئەگەر بینی ژنەکەی زوبانی بڕی گەرمو گوڕو بەسۆز دەبێ لەگەڵیدا.
*ئەگەر ژنێکی زوبان بڕاوی بینی بەڵگەیە لەسەر پاکێتیو پارێزگاری.
*ئەگەر بینی زوبانی هەژارێکی بڕی شتێکدەدات بەکەسێکی نەزانو سووك.
*ئەگەر زوبانی نووسا بەگەروویەوە نکولی لەقەرز دەکات یان ئەو ئەمانەتەی لای دانراوە.
(نابلسی)دەڵێت: زوبان تەواویو جوانییە لەگەڵ بەڵگەو ناوبانگی باش.ئەگەر بینی زوبانی بڕاوەو دەستەلاتداربوو دەگەڕێتەوە بۆ وەرگێڕەکەی بەمردن یان لابردن.
*زوبانی مرۆڤ وەك قەڵەمەکی وایە.
*ئەگەر زوبانی پادشا درێژبوو ئەوا سنووری ولاتەکەی بەرینو فراواندەبێ، ئەگەر زوبانی بەئەندازەیەك درێژبوو هەتا گەیشتە ئاسمان بەهۆی ستەمو زۆرداریيەوە لەکار لادەبرێ.

*زوبان بەمنداڵێکی شیرەخۆرە ناوزەد دەکرێ لەگەڵ شێری نێو ئەشکەوتو سوارچاکی فێڵباز، ئەوەی شێری لەئەشکەوت دەرکرد زوبانی لەزاری دەرهێناوە.
*ئەگەر بینی زوبانی لەدەستدا منداڵە شیرەخۆرەکەی لەدەستدەدات، بەهەمان شێوە ئەگەر بینی ئەسپەکەی بەردا.
*ئەگەر بینی زوبانی بڕاوەو دادگایی هەیە بەڵگەکەی شکستدەخواو دەدۆڕێ.
*ئەگەر بینی زوبانی هاوسەرەکەی بڕاوە ژنێکی داوێنپاکی بەئابڕوە.
*ئەگەربینی موو لەزوبانی هاتوە دەگونجێت هۆنراوەبێت دایبنێ یان رێکیبخات.
*ئەگەر بینی زوبانی خۆی دەخواتو ئەگەر لەخەڵکی گشتیبوو پەشیماندەبێتەوە لەقسەیەك کردوویەتی، ئەگەر لەمنداڵیدابوو بەناهەق ماڵی خەڵکی دەخوات.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر زوبانی خۆیخوارد فرە بێدەنگو خەشمو قینگرو دڵڕاگر دەبێ.
*بڕینی زوبانی فەرمانڕەوا لابردنیەتی.

* ئەگەر بینی ئەشكەوتێكی هەیەو شێرێكی تێدایە ئەشكەوتەكە دەمیەتیو شێرەكەش زوبانیەتی.
* ئەگەر شێرەكەی بەردایە خەڵكی هەتا بیانخوات بەڵام نەیخواردن ئێشو ئازار بەخەڵكی دەگەیەنێت بەزوبان.
* برینی زوبانی شاعیرماڵو سامانێكە پێی دەگات لەوانەوە كەپەیوەندی لەگەڵدا بریوون ، ئەگەر سووكو نزمبوو درۆ دەكات، ئەگەر ترسابوو بینی زوبانی دەشكێ كاروباری خۆی بۆدەشارێتەوە لەبەرانبەر ئەوانەدا كە دووزوبانە لەگەڵیان.
* ئەگەر گازی لەزوبانی خۆیگرت خەشمو قینی خۆیدەگرێ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زۆرخواردنی.
* ئەگەر بینی چەند زوبانێكی هەیەو شكۆمەندو ڕێزدارنەبوو كوڕی پێدەبەخشرێ.
* ئەگەر ڕەنگی هەر زوبانێك جیاوازبوو بەڵگەیە لەسەر جیاوازی وتەو ئەوانەی گەواهیدەدات لەسەریان.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەڵەكانی یاخود لەوكەسانەبێت هەڵەدەكەن لەخوێندنەوەیاندا.
* ئەگەر بینی خەڵكی زوبانی دەلێسنەوە یان دەیمژن خوازیاری وەرگرتنی زانیارییە، دەگونجێت بۆ فەرمانڕەوا بەڵگەبێت لەسەر جێگرو بەردەستو وەزیرەكانی. دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵو سامانی هەڵگیراو یان پلەوپایەو زانیاری، هەروەها بەڵگەیە لەسەر خزمەتكارێكی بەرژەوەندی پارێز یان كرێگرتەی باش یاخود دوژمنێكی گەندەڵو پیس.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+كشتوكاڵی بەروبوومدار.
+ژنی ڕەوشتخراپ قبوڵی وتەو قسەلەكەس ناكات.
+رزقو ڕۆزی.
+گسكدەری ڕێگەوبان.
+شوێنەوارهەڵگر.
+ئەوەی نهێنی دەدۆزێتەوە.
+پۆلیسو بەرپرسی زیندانیەكان.
* دەگونجێت زوبانی ئاژەڵ بەڵگەبێت لەسەر مردنو ژیان چونكە زوبان وەك دەست وایە.
* ئەگەر فەرمانڕەوایەك بینی زوبانی بڕاوە دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لابردنی جێگرەكەی یان وەزیرو بەردەستەكانی یان ماڵو سامانی بێشومار لەدەستدەدات ، یاخود دەگونجێت دادپەوەری لەهەندێك شارو شارۆچكەی سەربەوڵاتەكەی

هـەڵبگیرێو وێنـەو شـكۆو ڕێـزی بشكێنرێ.

*ئەگـەر زانایـەك بینـی زوبـانی بـڕاوە لەدەمەدەمـەو گفتوگـۆدا دەدۆڕێ، دەگونجێـت بەردەسـتو قوتـابیو كوڕەكەی بمرن.

*ئەگەر پیشەوەرێك بینی زوبانی بڕاوە شـەریكو كرێگرتەكـەی لەدەستدەدات، دەگونجێت لانەوماڵەكەی بفرۆشێ یان ئاژەڵەكەی بمرێ.

*دەگونجێـت لەكیـسدانی زوبـان بەڵگـەبێت لەسـەر گاڵتـەو سـووكایەتی دوژمـن لەخانـەوادەو دراوسـێ یـاخود مەرگی دۆستو خۆشەویستانو نـەمانی چاكە لەگەڵیان.

*دەگونجێت دارودرەختەكانی لەگرتنی بەروبووم بكەون.

*دەگونجێت لەكیسدانی زوبانو بڕانـی بەڵگەبێت لەسەر تەلاقدانی هاوسەر یان قسەووتەی بچڕێ لەو شوێنە یان ڕزقو ڕۆزی نەمێنێ.

*ئەگەر زوبانێكی بڕاوی بینـی بەڵگەیـە لەسـەر مردنـی تلیـاكخۆرو گـسكدەری ڕێگـەوبان یـان شـوێنەوارزان یـاخود پیاوێك پەی بەنهێنی دەبات یا پیاوێكی دڕندە.

*ئەگەر چەند زوبـانێكی بینـی بەڵگەیـە لەسـەر زیـادبوونی ماڵوسـامان یـان ئەنـدامی خانـەوادەو فراوانبـوونی زانیـاری، دەگونجێـت بەچـەند زوبانێـك بدوێت.

*ئەگەر زوبـانێكی تـری لەگـەڵ زوبـانی خۆی بینی بەڵگەیە لەسـەر دووزوبـانو فیتنەچێتی لەنێوان خەڵكیدا.

*ئەگـەر زوبانـە زیادەكـە بێگوتـەو سـوودنەبوو دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر ڕاسـتگۆییو هێمنـی بـەپێی ئایەتی: ﴿وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ﴾(الشعراء:٨٤).

*دەگونجێـت زوبـان بەڵگـەبێت لەسـەر ئەوەی مرۆڤ دەچێتەژێری وەك سەقف.

*دەگونجێت بڕینـی بـۆ زانـا بەڵگـەبێت لەسـەر بێـدەنگیو سوپاسـگوزاری خوداوەند.

*ئەگـەر بینـی مـوو لـەزوبانی هـاتوە ئەگـەر پیـشەكەی قـسەبوو سیـستەمو حاڵی لێدەشێوێ، ئەگـەر لەقسەكاران نـەبوو پەیـداكردنی بـژێوی قورسوگراندەبێ.

*دەگونجێـت زوبـان بەڵگـەبێت لەسـەر دیل یان مار لەژوورەكەیدا.

*ئەگـەربینی تەماشـای زوبانیـدەكات زوبانی خۆیدەپارێزێ.

**زوبـان لاركردنـەوە:** (نابلـسی)دەڵێـت: لەخـــەودا دووڕووییـــــە، لەئاینـــــدا گۆڕانكارییـــە لەقورئانــدا ، خوداوەنــد دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ﴾ (ال عمران: ٧٨).

**زوحەل(كەیوان):** ئەگەر لەخەودا بینـرا بەڵگەیە لەسەر تووڕەكردنو دەستەڵات یانخود چاوبڕینە دەسـتەڵات ، ئەگـەر پەیوەندی بەمانگەوەهەبوو.

*یـــەكێكی ســـتەمكارە دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر هـــەژاریو زیـــانو نارەحەتی.

**زوڕنا(كلارنێت):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی فەرمانڕەواو دەستەڵاتدارێك زوڕنایـەكی دایـە دەسـتەڵاتو پلەوپایـە بەدەستدەهێنێ ئەگەر شایستەبێ بەڵام ئەگـــەر شایـــستە نـــەبوو دەرووی لێدەكرێتەوە.

*ئەگـەربینی پەنجـەكانی دەخاتەسـەر كونـەكانی زوڕنـا فێـری قورئانـدەبێ لەگەڵ ماناكانیو باش خوێندنەوەی.

*هـەروەها دەڵـێن: ئەگـەر نەخۆشـێك بینی زوڕنا دەژەنێ دەمرێ.

(نابلــسی)دەڵێــت: بینینــی لەخـــەودا بەڵگەیەلەســەر ئـارەزوو و جموجـوولو هەڵگیرســـــانی فیتنــــەو ئاشــــووب، دەگونجێت بەڵگـەبێت لەسـەر خۆشـیو شادی.

*ئەگەر زووڕنایەكی بەدەستی خۆیـەوە بینی ئەگـەر لـەقورئانخوێنانبوو بەشـی خۆی لێوەردەگرێ بـەپێی فـەرموودەی حەزرەت (ﷺ) كەدەفەرموێ دەربـارەی (ئەبوموسا): "بەشـێك لـەئاوازی داودی پێدراوە"[1].

*ئەگەر زوڕنایەكی زێڕی بەدەسـتیەوە بینی لێیـدەدا بڵاوبوونـەوەی دانایيـەتی ئەگەر دانابێتو بۆنـەخۆش مردنیـەتیو بۆ دووزووبان درۆیەو بۆ خوازیاری كـوڕ كوڕە.

**زولقەرنـەین(سـەلامی خـوای لێبێـت):** (نابلـــسی) دەڵێـــت: بینینـــی بەڵگەیـــە لەسـەر ئەمانـەتپارێزیو گرتنـە خـۆی ئەسپەردەو ئەمانەت.

**زولكفـل(سـەلامی خـوای لەسـەربێت):** (نابلـــسی) دەڵێــت: بینینــی بەڵگەیــە لەســـەر ئەمانـــەتپارێزیو گرتنــــەخۆی ئەسپەردەو ئەمانەت.

---

[1] (بوخاری) له كتاب((فضائل القرآن) باب (حسن الـــــصوت بــــالقرآن) (٧١٠/٨ـــــ ٧١١) فـــــەرمـــوودەی (٥٠٤٨) هێناویـەتیو(مـسلم) كتـاب (صـلاة المـسافر) بـاب(استحباب تحسين الصوت بالقرآن (٣٣٧/٣) (٧٩٣/٢٣٥).

**زوهــدو خواناســی( دنیانەویــستی ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا شیرینکردنە لەلای خەڵکی بەپێی ئەو وتەیەی دەڵێ: "دوورەپەرێزبە لەوەی خەڵکی پێیەتی ئەوجا خەڵکی تۆیان خۆشدەوێ".

## زۆ

**زۆرانبــازی:** (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: زۆرانبـازی بەڵگەیە لەسـەر شـەڕکردنی مــرۆڤ یــان بــوونی پەرتــەوازەیی لــەکاروبارداو کوشــتار لەگــەڵ کەســێکیتردا چــونکە زۆرانبــازی ســەرەتای کوشــتارە بەچــەك دەستپێدەکات، ئـەم خەونـە بەڵگەیـە لەسەر هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکدا.

* ئەگەر مرۆڤ بینی بەچەك زۆرانبازی دەکـات خەونەکـەی بەڵگەیـە لەسـەر بەسـتنی گرێـی هاوسـەرداری لەگـەڵ ژنێکی دەوڵەمەنـدی دەستبڕ هـەژارانی خۆشدەوێ‌و شێوەو نموونەی نییە.

* شمـشێر وەشـاندن بەدەسـتهێنانی ڕێـزە لـەلای پـەروەردگارەوەو بینینـی شمشێری ناسراو بەدەستی کەسێکەوە ناوبانگ دەرکردنیەتی بەکارێك.

(نابلــــسی)دەڵێــــت: لەخــــەودا شەڕوپێکدادانە ، ئەگـەر ڕەگەزەکـەیان جیـاوازبوو لـەزۆرانباز باشـترە لـەزۆران لەگەڵگیراو.

* ئەگەر لەنێوان دووپیـاودابوو زۆرانبـاز دەدۆڕێ.

(ئـیبن سـیرین)دەڵـێن: ئەگـەربینی مەیدان لەپیاوێك دەگرێ پشکی‌و بەشی بەردەکەوێت ئەگەر زاڵنەبێت بەسەریاو ببەزێ ، ئەگەر لەشێرو پشکدا دەرچوو غەم‌و پەژارە رووی تێدەکات‌و زینـدانی دەکـرێ پاشــان قوتــاردەبێ بــەپێی ئایــەتی : ﴿فَـسَاهَم فَكَــانَ مِــنَ الْمُدْحَضِينَ﴾(الصافات:١٤١).

* زۆرانبــازی ئەگــەر لەدووڕەگــەزی جیـاوازبوو زۆرانبـاز باشـترە لـەزۆران لەگـەڵگیراو وەك مـرۆڤو دڕنـدە، ئەگـەر زۆرانەکە لەنێوان دووپیاودابوو زۆرانبـاز دەبەزێ.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیـە لەسـەر بۆڵـە بــۆڵ‌و تیروپــــشك ، مەیــــدانگرتن زیادەڕەوییە.

(نابلـسی) دەڵێـت: ئەگـەر لەخــەودا مرۆڤـی بینـی کێشمەکێشی لەگـەڵکرد مــاڵ‌و سـامانی خەرجـدەکات، ئـەوەی لەکێشمەکێـشدا دەبــەزێ‌و دەکــەوێت بەســەر زەویــداو لــەکاتی بێداریــدا زاڵدەبێت.

* ئەگــەر دوو پادشــا بەربــەرەکان‌و کێشمەکێـشیانکردو جـەنگ بـەرپابوو لەنێوانیاندا سەرکەوتوو دۆڕاوە.

*دەگونجێت سەرکەوتوو لەواقیعدا سەرکەوتوو بێت ئەگەر لەخەوەکەدا بەڵگەیەك هەبوو بەهێزو پتەویدەکرد وەك ئەوەی سەردەکەوێ بەسەر نەیارەکەیدا لەزۆرانبازیداو جل‌وبەرگێکی نوێی لەبەردابێت‌و دۆڕاویش جل‌وبەرگەکەی شڕو کۆن‌و دڕاوبێت، ئەگەر هەردووکیان لەجل‌و بەرگدا هاوتاو سەرکەوتوو و بالاّو بەرزو لەش‌ولاری مەزنبوون‌و دۆڕاویش بچووك‌و لەش‌ولار کزولاوازو ڕەنگی زەردبوو سەرکەوتوودەبێت بەسەریا لەکاتی بێداریدا بەپێچەوانەوەشەوە.

*هەروەها بەبێ بەڵگەش دەگونجێت سەرکەوتوو هەرسەکەوتووبێت لەوەی خەونەکە دەقاو دەق بێتەدی یاخود هەردوو ڕەگەزەکە لەخەودا جیاوازبن بەلاّم براوە حالّی باشتربێ لەدۆڕاو وەك مرۆڤو دڕندەیەك.

*ئەگەر بینی زۆرانبازیدەکات ئەگەر ئەنجامیدا سەرکەوتوو دەبێت.

*زۆرانبازی بەڵگەیە لەسەر لەشساغی نەخۆش‌و چاکبوونەوەی مەگەر زالّبێت بەسەر مرۆڤێکدا ئەوجا بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*ئەگەر لەخەودا زۆرانبازیکرد لەگەڵ ئاژەڵێکداو کۆشتی بەڵگەیە لەسەر قوتاربوونی لەناڕەحەتی‌و قەیران، ئەگەر ئەوکەسە ناموسوڵمانبوو بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتن‌و زالّبوون بەسەر دوژمنەکانیدا.

**زۆرخۆری (ئینتەلا):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیەلەسەر سوودخواردن.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر هەرسبوو سوور دەبێت لەسەر کاروبارەکانی.

**زۆردار( ستەمکار):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی دەم پیسە، هەروەها دەڵێن: پیاوێکە زۆر جنێوبەخەڵکیتر دەدات.

*بینینی بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارەو نەخۆشی سنووروو غەرامە.

**زۆرداریی:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر مرۆڤ لەخەودا بۆخۆی هەستی پێکردو ئەوسیفەتەی هەڵگرت بەڵگەیە لەسەر حەزوئارەزووی نەفس بۆکاروکردارێك شایستەی ئاگری دۆزەخ بێت.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: زۆرداریی دەرەنجامەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زۆدارو ستەملێکراو سەرکەوتوو دەبێت بەپێی ئایەتی : ﴿إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَى أَنفُسِكُم﴾لەگەڵ ئایەتی ﴿ثُمَّ بُغِيَ عَلَيْهِ لَيَنصُرَنَّهُ اللَّهُ﴾.

(نابلسی) دەڵێت: زۆرداریی بەڵگەیە لەسەر دنیاو رووتێکردنی ئەگەر شایستەی دەستەڵاتو پلەوپایەبوو پێی دەبەخشرێ بەڵام سەرەنجامەکەی خراپ کۆتایی دێت ئەگەر ئەو ستەمکاربوو بەڵام ئەگەر ستەمی لێکرا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پەروەردگار سەریدەخات.

(نابلسی) دەڵێن: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەخێرایی هاتنی وێرانەیی‌و لانەوماڵ.

*دەگونجێت زۆرداریی بەڵگەبێت لەسەر زانستخوازان یان قورئان.

*ئەگەر بینی بوە بەستەمکار هەژاردەکەوێ.

*ئەگەر دانینا بەستەم‌و زۆرداریی خۆیدا تەوبەدەکات.

*ئەگەر بینی ستەم لێکراوێ دوعای لێدەکات با ئاگاداری سزای خوایی بێت.

*ئەگەر بینی خۆی ستەمی لێکراوەو دوعا لەستەمکارەکەیدەکات، ستەملێکراو زاڵدەبێ بەسەر ستەمکارەکەیدا.

*ئەگەر بینینی ستەمکارەکەی دوعای لێدەکات مژدەیە بۆی چونکە دوعا دەگەڕێتەوە بۆی.

**زۆروتن :** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیاهەڵدان‌و خراپەوتن، ئەگەر لەدادگاییدابوو بەڵگەکەی لاوازدەبێت‌و بەرانبەری دەبەزێ ، وەگەرنا هەژارێکی داماو دەبێت بەسەر خەڵکییەوە یاخود بێ باوك‌و منداڵدەبێ.

**زۆری ژمارە:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا حەشامێکی زۆری بینی یان هەژاری‌و نەداری سەربازەکانی زیاد دەکەن‌و پلەوپایەو دەستەڵاتی مەزن دەبێ‌و ناوی بەرزدەبێتەوە ، ئەگەر بازرگانبوو مامەڵەکارانی زۆر دەبن ، ئەگەر بانگخوازبوو وەڵامدەرانی زۆر دەبن.

## زە

**زەبوری ( داود ) ـ سەلامی خوای لێبێت ـ:**

لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+گریان‌و شیوەن‌و تەوبەو ترس‌وبیم‌و بەندایەتی‌و دڵکۆکبوون‌و بەخت‌و شانس لەشایی‌و ئاهەنگدا.

+بیستنی هەواڵی سەیرو خراپ.

+رزق‌و رۆزی پەیداکردن بەهۆی خوێندن‌و تاردانەوە.

**زەبەرجەد**[1] : براو منداڵی ڕێزدارە یان ماڵو دارایی حەلاڵە.

*وتەی پاكو دڵسۆزانە زانیاریو چاكەیە، دەگونجێت ئاینداروخواناسبێت.

**زەرافە** : لەخەودا هیچ خێرێكی تێدا نییە ، ئەگەر بەبێ هۆ بێتە ماڵێكەوە بەڵگەیە لەسەر بەڵاو نەهامەتی لەسەر ماڵو دارایی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنی شۆخو شەنگ یان ئاگاداربوون لەهەواڵی سەیر لەلایەكەوە.

*زەرافە بەژن لێكدەدرێتەوەو تەباو سەقامگیر دەبێت لەگەڵ مێردەكەی.

**زەردباو** : (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا سووكیو رسواییە.

**زەربڕە**[1] : (ئیبن سیرین) دەڵێت: زەربڕە باسو خواسێكی باشە.

**زەردگەر** : (ئیبن سیرین)دەڵێت: زەردگەر پیاوێكە خۆشییەكانی دنیا دەڕازێنێتەوەو لەلای خۆیدا بەكێشیدەكات.

(نابلسی)دەڵێت: پیاوێكی ئاینپەروەرە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قسەهەڵبەست، هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر زانای مۆچیاریدەر كەژەنگی دڵەكان بەئامۆژگاری پاكدەكاتەوە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێكە خاوەنی دنیایەو شەڕ زاڵدەكات بەسەر خێردا.

*هەروەها دەڵێت: پیاوێكی شەڕانییە.

*ئەگەر یەكێك كەخوازیاری هاوسەگیرییوو ویستی هەمانكاری زەردگەران ئەنجامبدات خەوەكەی بەڵگەیە لەسەر رەوشتی جوانی ئەو ژنە.

(نابلسی) دەڵێت: زەردگەر پیاوێكی دەستبڕو فروفێڵاویە ناپاكی لەگەڵ خەڵكیدا دەكاتو دەیانترسێنێ، هەروەها پیاوێكی شەڕەنگێزە.

*ئەگەر بینی كاری زەردگەڕان ئەنجامدەداتو ویستی هاوسەرگیری ئەنجامبدات ژنێكی رەوشت جوانی زماندرێژ دەهێنێت.

**زەرد هەڵگەڕان لەخەودا** : بەڵگەیەلەسەر غەمو پەژارەو بەرەبەركانیو بەڵاو نەهامەتی.

**زەردەواڵە** : (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێكی ئاژاوەچی پەستونیگەرانو شكۆمەندو خاوەن كوشتارە.

---

[1] **زەبەرجەد** : بەردێكی بەنرخی گرانبەهایە. (وەرگێڕ).

[1] **زەربڕە** : بۆنێكی خۆشە. (وەرگێڕ).

*هاتنی کۆمەڵێ زەردەواڵە بۆ شوێنێك بەڵگەیە لەسەر هاتنی سەربازی ئازاو خاوەنشکۆ بۆ ئەو شوێنەو جەنگاندن لەگەڵ دانیشتوانی ئەو شوێنەدا.
*دەگونجێت پیاوێك بێت بەخۆڕاییو لەسەر ڕەویەی پووچگەرایی مشتومڕیکات.
*وتراوە پیاوێکی هیچو پووچو نانپیسەو پێوەدانیشی وتەیەکە خەڵکی بریندار دەکات.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دوژمنێکی جەنگاوەرە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+بیناو ئەندازیار.
+ڕێگرو خاوەن بژێوی حەرام.
+گۆرانی بێژێکی تەپڵلێدەر.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر خواردنی ژار.
*هەروەها دەڵێن: زەردەواڵە بەڵگەیە لەسەر خەڵکێکی بێسۆزو بەزەیی یان بەڵگەیە لەسەر پیاو خراپ.
*ئەگەر بینی چارەسەری کۆمەڵە زەردەواڵەیەکدەکات چارەسەری خەڵکی سووكو نزمی بێدەستەلاتدەکات.

**زەروو( زاڵو )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: زەروو لەلێکدانەوەدا منداڵە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر زەروویەکی بینی لەلووتی یا عەورەتی یاسكو دەمی هاتە دەرەوە ژنەکەی منداڵی لەباردەچێو لەوەی نەشونما بکات.
*زەروو بەڵگەیە لەسەر دوژمنی سووكو رسوا.
*(دمیری) دەڵێت: پیاوێکهات بۆ لای (ئەبوبەکری صدیق) (ڕەزای خوای لێبێت)و وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر (ﷺ) لەخەودابینیم کیسەیەکم بەدەستەوەیەو بەتاڵیدەکەمەوە هەتا هیچی تیانەماو زەروویەکی لێهاتەدەرەوە، ئنجا (ئەبوبەکر)(ڕەزای خوای لێبێت) وتی: برۆ دەرەوەو پاش ئەوەی چەند هەنگاوێك ڕۆیی ئەوجا ولاخەکەی فرێیداو کوشتی، پاشان بە(ئەبوبەکر)یان وت ، ئەویش وتی: سوێندبێ بەخوا نەمویست لەبەردەستی مندا بمرێ، ئەوخەوەی بینی بووی بەم شێوەیەبوو: کیسەکە مرۆڤبوو درهەمەکان تەمەنو زەرۆکەش روحبوو بەپێی ئایەتی : ﴿ خَلَقَ الانسانَ مِن عَلقٍ ﴾ (العلق: ٢)[1]

**زەڕەنگەر( ئاڵتوونچی )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: زەڕەنگەر لەخەودا دڕندەیەکی درۆزنەو هیچ خێرێکی تێدانییە، چونکە

[1] حیاة الحیوان: ٢/٢١٠.

وته ڕێکدەخات لەگەڵ ئاگرو دوکەڵی زێڕدا. ئەگەر لەمزگەوتەدابوو یان قورئانی خوێندەوە بەڵگەیە لەسەر هەموو چینەرێك لەگەڵ کەسێك پیشەکەی دەرکردنی شتێك بێت لەشتێکیتر.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ڕوپامایی‌و درۆو ناپاکی‌و هەڵبەستن.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر دانانی هۆنراوە یان وتەی هەڵبەستراو.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر زانیاری‌و ڕێنومایی‌و شایی‌و هاوسەرو منداڵ.

*بینینی زەڕەنگەرێکی نادیار ئەوەیە کەدرۆ ڕێکدەخات‌و ترش‌وخوێدەکات بەلێدوان‌و وتەوە.

*ئەگەر بینی زێڕو زیوو دەردەهێنێ لەئاگرو دەیپارێزێ درۆزنێکەو خەڵکی تووشی فیتنە دەکات، ئەگەر بینی سواری زێرو زیو دەبوو پیاوێکە تەبایی دەخاتە نێوان خەڵکی لەشتێکی مەترسیداراو بەشەڕ دەستپێدەکات‌و بەخێر کۆتایی دێت.

**زەکات:**(ئەبوسەعد) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ئەگەر بینی زەکاتی ماڵەکەیدەدات بەو مەرجانەی هەیە لەماڵ‌و سامان بەدەستدەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿ وما آتيتم من زكاة تريدون وجه الله فاولئك هم المضعفون ﴾ (الروم: ٣٩).

*بینینی خێر لەخەودا جیاوازە بەپێی بینینی حاڵ‌و باری خەوبینەران ، ئەگەر زانایەك بینی خێردەکات زانیاری بەخەڵکی دەبەخشێ.

*ئەگەر دەستەلآتدارو فەرمانڕەوایەك بینی خەڵکی بەکاربەدەست دادەنێت.

*ئەگەر بینی نانددەدات بەهەژارێك لەخەم‌و پەژارەکانی قوتار دەبێت‌و دڵنیادەبێت ئەگەر ترسابوو.

*ئەگەر نانیدا بەبێباوەڕێك ئەوە دوژمن بەهێز دەکات.

*لێکدانەوەی هەژار کەسێکی تاقیکراوەیە.

*ئەگەر بینی سەرفیترەیدا زۆر نوێژو یادی خوا دەکات بەپێی ئایەتی: ﴿ قد أفلح من تزكى ، وذكر اسم ربه فصلى﴾ (الأعلى:١٤ـــ ١٥)و قەرزدەداتەوە.

*ئەگەر قەرزاربوو نەخۆشی‌و لەشگرانی بەهیچ شێوەیەك ڕووی تێناکات.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی ماڵ‌و دارایی ، ئەگەر بینی زەکاتی ماڵەکەیدەدات بەڵگەیە

لەسەر نەشونماو زیادبوونی لەوساڵەدا.

*ئەگەر بینی زەکاتی ماڵەکەی دەدات بەوشێوەیە خوداوەند فەرزیکردوە لەسەری، ئەگەر دەوڵەمەندبێت ماڵو نیعمەتی دەستگیردەبێتو نوێژەکان لەکاتی خۆیدا ئەنجامدەدات.

*زەکاتی ماڵ بەڵگەیە لەسەر:

+خێرو چاکەو خۆقایمکردن لەبەرانبەر دوژمندا.

+شەونوێژو زۆربەرۆژوبوونی سوننەت.

*دەگونجێت زەکاتدان بەڵگەبێت لەسەر:

+غەرامەکردن.

+مەرگی کەسێکی خۆشەویست.

+لەدەستدانی ئەندامێکی لەشولار.

+قەرزو پارەی بەسوود.

+قەرزدانەوە.

+زۆری سوودو قازانجو پشوودەرکردن.

+پلەوپایە بەرزکردنەوەو بەلاو نەهامەتی پەرچدانەوە.

*ئەگەر بینی زەکات دابەشدەکات خوداوەند کاروبارەکانی بۆ ئاساندەکاتو تەوبەی پێدەبەخشێ.

*زەکاتی رۆژو لەخەودا سوودو قازانجە.

*زەکاتی کانزاو زیو مژدەیە بەکوڕ یان هاوسەر، ئەگەر خەوبینەرو هەژاربوو مژدەیە بۆی بەوەرگرتنی کاری پەسەندو گونجاوو تەوبەکردنی، ئەگەر خراپبوو خوداوەند ماڵو دارایی حەلاڵی پێدەدات.

*ئەگەر بێباوەڕبوو موسوڵماندەبێتو دەبێت بەزەکاتدەران.

**زەکەریا( سەلامی خوای لێبێت):** ئەوەی بەدیبکات بەپیری خوداوەند کوڕێکی خواناسی پێدەبەخشێ.

(نابلسی) دەڵێت: کوڕێکی پیاوچاکو گەورەی پێدەبەخشێو خوداوەند ژینی خاوەن خەونەکە دەسازێنێ بۆی.

**زەمزەم:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەئاوی زەمزەمی خواردەوە بەڵگەیە لەسەر چارەسەر لەسەرجەم نەخۆشیەکان بەتایبەت ئەگەر بۆ هۆیەکی تایبەتو دیاریکراو خواردیەوە وەك بەدەستهێنانی ماڵ یان فێربوونی زانیاری.

*هەروەها (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی ئاوی زەمزەم بخواتەوە خێری دەستگیردەبێت لەلای چاکەوەو ئەوەی خوازیارو داواکاریەتی بەدەستیدەهێنێت.

**زەمیلە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر کۆیلەو بەندە.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بژێوی پەیداکاری ماڵ ئەوەی حەزو ئارەزووی خانەوادەکەی بەجێدەهێنێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەر یان خزمەتکار یا کوڕ.

*زەمیلەی پەتدار بەڵگەیە لەسەر خزمەتکار.

*زەمیلە کۆڵهەڵگر متمانەپێکراوە.

**زەمین لەرزە( رمان ـ روخان ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر زەوییەك تووشی زەمین لەرزە هات و خەوبینەر ڕۆچوو لەنێویداو کۆمەڵێکیش قوتاربوون دەستەڵاتداری ڕوو لەو زەوییە دەکات و سزای دانیشتوانەکەی دەدات. ئەگەر نەماو پاشان جێگیربوو دەستەڵاتداری ئەو شوێنە یاخود مەزنمی نارەحەتی پێدەگات بەو ئەندازەیە دەڕەوێتەوە.

*ئەگەر زەمین لەرزە روویدا پادشا ستەم لەژێردەستەکانی دەکات یاخود فیتنەو نەخۆشی روویان تێدەکات.

*ئەگەر گرمەو نالەی هەور ببیستێ فیتنەو ئاشوب روودەکاتە خەڵکی ئەو ناوچەیەو زیان و دوژمنایەتی روودەدات.

*هەندێکدەڵێن: خۆرگیران و زەمین لەرزە بۆسەرجەم خەڵکی بەڵگەیە لەسەر تیاچوونی خەڵکی و فەوتانی شتومەکیان.

*ئەگەر مرۆڤێك بینی زەوییەك دێت و دەچێت بەڵگەیە لەسەر جووڵەی خەوبینەرو بژێوی، بەلام ئەوەی ببینێ سەرما لێیداوە تووشی هەژاری دەبێت، ئەگەر بەئاگرو پشکۆ خۆی گەرمکردەوە پێویستی بەڕەنج و هەوڵدەبێت بۆکاری فەرمانڕەواو مەترسیەکی گەورەی تێدا روودەدات.

*هەندێکدەڵێن: سەرما بۆ موسافیر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سەفەرەکەی روونادات و کاروباری بۆنایەتەپێش ، تەمو مژیش کاروباری تێکەڵ و پێکەڵ و فیتنەیە، ڕۆژی تەمو مژاوی غەمو پەژارەو بەڵاو نەهامەتی و قەیرانە.

(نابلسی) دەڵێت: زەمین لەرزە لەخەودا ترسانە لەدەستەڵاتدار.

*هەروەها دەڵێن: زەمین لەرزە لەشوێنی دیاریکراودا بەڵگەیە لەسەر گواستنەوەو بارکردن.

*زەمین لەرزە رووداوێکە لەلایەن دەستەڵاتدارێکی مەزنەوە روودەدات ، ئەگەر گشتیبوو رووداوەکە گشتیدەبێت.

*ئەگەر چیایەکی بینی کەوتە لەرزین‌و جوولە یاخود لەشوێنی خۆی جێگیربوو ئەو شوێنە بەڵاو نەهامەتییەکی گەورە رووی تێدەکات.

*ئەگەر زەوییەکی بینی هاتە لەرزین‌و کۆمەڵێکی تیابردو کۆمەڵێك پارێزراوبوون دەستەڵاتدار روو لەو زەوییەدەکات‌و دانیشتوانەکەی دەچەوسێنێتەوە.

*هەروەها دەڵێن: نەخۆشییەکی سەخت‌و گرانە ، ئەگەر زەمین لەرزە رووی لەشوێن‌و جێگەیەکیکرد پادشا ستەم لەبەردەستەکانی خۆیدەکات هەتا سەرسام دەبن یان نهێنییان بڵاودەبێتەوە.

*ئەگەر بینی زەوی هاتۆتە لەرزە بەڵاو نەهامەتی روودەکات لەخەڵکی ئەو شوێنە لەنەبوونی‌و سەرماو سۆڵەو ترس‌و بیم.

*هەروەها ئەگەر لەخەودا روودانی زەمین لەرزە بینرا بەڵگەیە لەسەر راچڵەکین‌و هەواڵی ناقۆڵاو دەرکەوتنی نهێنی.

*ئەگەر ژنێکی دووگیان بینی منداڵەکەی دادەنێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بشێوی خەڵکی بەهۆی نەخۆشکەوتنی خەڵکی‌و قوتاربوونیان.

*ئەگەر دیوارەکان رووخان مەرگی راستەقینەیە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی خەوبینەر دەمرێ.

*هاتنە لەرزەی زەوی رەق‌و سەخت بەڵگەیە لەسەر نەش‌ونماکردنی بەکشتوکاڵ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیندوکردنەوەی زەوی‌وزاری مردوو.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+سەفەر بەدەریادا.

+سەماو خۆشی دەربڕین.

+پوچەڵکردنەوەی سەفەرە بەدەریادا.

+غەم‌و پەژارەی هاوسەرە.

*ئەگەر ماڵ‌و خانوو رووخا دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سوودو قازانجی پیشەسازی.

*ئەگەر زەمین لەرزەکە لەکێڵگەو بێستاندابوو بەڵگەیە لەسەر زۆربوونی کشتوکاڵ‌و زیادبوونی بەروبوومی هاوینە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر فیتنەو ئاشووبی خەڵکی گوندنشین.

*ئەگــــەر خەونەكـــە لــــەمانگی ((ئایـــار))دابـــوو بەڵگەیـــە لەســـەر كوشتارێك لـەنێوان خەڵكیدا روودەدات لەگـــەڵ فیتنـــەو بـــەڵاو نەهامـــەتی بەردەوام، ئەگەر خەونەكە لەرۆژ یاخود شەودابێت.

*ئەگــــەر خەونەكـــە لــــەمانگی ((حـوزەیران))دابـوو بەڵگەیـە لەسـەر تیاچوونی خراپـەكاران، ئەگـەر رۆژبـوو بەڵگەیە لەسەر دیاریكردنی پلەوپایە بۆ زانایـان، ئەگـەر لـەمانگی ((تـەموز))دا بینی بەڵگەیە لەسـەر مـەرگی پیـاوێكی ناودارو شكۆدار.

*ئەگــەر لــەمانگی ((ئــاب))دا بینـــی بەڵگەیە لەسەر دوژمنێك كەروودەكاتـە ئەو شوێنە.

*ئەگـەر لـەمانگی ((ئـەیلول))دا بینـی بەڵگەیە لەسەر پیاوێكی غەریب روو لەو زەوییەدەكات، پاشان بەڵاو نەهامەتیو تیاچوون روویان تێدەكات.

*ئەگەر لـەمانگی (تـشرینی یەكـەم))دا بینـــی بەڵگەیـــە لەســـەر نەخۆشـــیو سەلامەتی ژنـی دووگیـانو ئاسـانبوونی خۆشەویستی.

*ئەگەر لـەمانگی ((تـشرینی دووەم))دا بـــوو هەســـت بـــەدانانی منـــداڵی ژنـــی دووگیاندەكات.

*ئەگەر لەمانگی ((كـانوونی یەكـەم))دا بینـــی بەڵگەیـــە لەســـەر روودانـــی نەخۆشـیەكی سـەختو مـەرگ وێـڕای دڵنیابوون لەدوژمن.

*ئەگەر لەمانگی ((كـانوونی دووەم))دا بینی بەڵگەیە لەسەر مەرگی لاوان.

*ئەگەر لە((شـوبات))دا بینـی بەڵگەیـە لەسەر برسێتیو لەبارچوونی منداڵ.

*ئەگــەر لــەمانگی ((ئــازار))دا بینـــی بەڵگەیـــە لەســـەر خۆشـــگوزەرانیو خۆشحاڵی.

**زەنـگ:** (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: زەنـگ پیـــاوێكی بانگبێـــژە لەلایـــەن فەرمانڕەواوە دانراوە.

(نابلـسی)دەڵێـت: زەنـگ خێرۆمەنـدە ئەگـەر لـەملی ئاژەڵدابوو، دەگونجێـت بەڵگەبێت لەسەر سەفەر.

*زەنگی مەسیحیەكان بەڵگەیـە لەسـەر ئـەو زانایـەی لـەكاتی كێـشمەكێشو ئەركدا پەنای پێدەبات.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر رزقو رۆزیو جەنگو نوێژ.

*زەنگی مەسـیحیەكان كەسـی خـاوەن راوێژو هەواڵگرە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بانگدان بـــۆ نوێـــژ یـــا خۆئامـــادەكردن بـــۆ رووبەڕووبوونەوەی دوژمن.

*دەگونجێت بیستنی دەنگی زەنگ لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر ئامادەبوونی کاروانی خێرهەڵگر یان گواستنەوەی لەشوێنو جێگەیەکەوە بۆ شوێنو جێگەیەکیتر.

*دەگونجێت زەنگ بەڵگەبێت لەسەر کتێبی بەرگتێگیراو یان رێبازو رێچکەی پێشینان.

(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی زەنگ لێدەدات هەواڵێکی ناحەقو بەتاڵ لەنێوان خەڵکیدا بلاّودەکاتەوە.

*ئەگەربینی (تەورات)و (ئینجیل) دەخوێنێتەوە ، بەلاّم لەماناکانی تێناگات رێبازو بۆچوونی خراپە، راوبۆچوونیشی هاوتای راوبۆچوونی جوولەکەو مەسیحیەکانە ، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ أَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ (البقرة: ٤٤).

*ئەگەربینی بوە بەقەشەیەك بیدعەی دروستکردوە بەپێی ئایەتی: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا ﴾ (الحديد:٢٧).

*هەروەها دەڵێن: خاوەنی ئەم خەونە بڕێویو رزقو رۆزی قورسوگراندەبێو کاروبارەکانی ئەستەم دەبنو لەهەموو هەنگاوێکدا ملکەچیو ترسو بیم رووی تێدەکات.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر فێڵکارێکی قۆڵبڕی بیدعەچی بانگەوازدەکات بۆ بیدعە.

(نابلسی)دەڵێت: زەنگ لەخەودا دەلاّلە یان ژنێکە منداڵی بانگبێژی هەبێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرداریو ئابڕوچوون.

*زەنگ بەڵگەیە لەسەر هاوڕێیەتی پیاوێکی بێخێرە.

*هەروەها پیاوێکی دووڕوە ، ئەگەربینی لەکاتی مامەڵەدا زەنگ لێدەدات لەکڕینو فرۆشتنو بازرگانیەکەیدا سوێند دەخواتو لێدانی زەنگیش سوێندی درۆیە.

**زەنگۆڵە:** (نابلسی)دەڵێت: کێشەو دەمەدەمەو قسەی بێمانایە.

**زەوی:** (ئیبن سیرین): دەڵێت: زەوی بەڵگەیە لەسەر دنیا بۆ یەکێك خاوەنی بێت بەپێی فراوانیو گەورەیی ، یان بچووکیو تەنگی.

*دەگونجێت زەوی بەڵگەبێت لەسەر دونیاو ئاسمانیش لەسەر قیامەتو دوارۆژ ، چونکە دنیا پێشخراوەو قیامەتیش دواخراوە بەتایبەت بەهەشت لەئاسمانە.

*زەوییەکی ناسراو بەڵگەیە لەسەر ئەو شارەی تێدایە لەگەڵ جێنشینانی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر گەشتو سەفەر ئەگەر ڕێگەیەك بێت بگیرێتەبەر، وەك بیابانو دەشت.
*بەڵگەیە لەسەر ژن ئەگەر لەوانەبێت سنوورو پەرێزی خۆیان دەزانن‌و سەرەتاو کۆتایی شارەزایان.
*بەڵگەیە لەسەر دایكو هاوسەر چونکە وەك زەوی وایە لەتۆوچاندن‌و ئاودان‌و بەربووم پێگەیشتندا.
*دەگونجێت زەوی دایك بێت چونکە ئێمە لەزەوی دروستبووین.
*ئەوەی ببینێ دەبێت بەخاوەن زەوییەکی نادیارو هەژاربێت دەوڵەمەند دەبێت، ئەگەر ڕەبەنبێت هاوسەر دەگرێت.
*ئەگەر ببینێ زەوییەکی فرۆشت یان لێی چوە دەرەوە دەمرێت ئەگەر نەخۆش بێت بەتایبەت ئەگەر ئەو زەوییەی ڕووی تێدەکات نادیار بێت، یاخود هەژار دەکەوێت ئەگەر دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتووبێت بەتایبەت ئەگەر ئەو زەوییەی کۆچ دەکات لێوەی گژوگیاو لەوەڕگای تێدابێت، یاخود لەپەیڕەوکردنی ڕێبازێکەوە دەگۆڕێت بۆ پەیڕەویکردنی ڕێبازێکی تر.
*ئەگەر لەزەوییەکی وشکەوە ڕوویکاتە زەوییەکی تەڕو بەپیت، لەبیدعەوە ڕوودەکاتە سوننەت ، ئەگەر بەپێچەوانەی ئەوەبوو واژوو دەردەچێت.
*ئەگەر بینی ئامادەی گەشتو سەفەرە بەڵێنێکیان داوەتێ لەگەشتو سەفەرەکەیدا دێتە دی.
*ئەگەر بینی زەوی درزو شقڵی تێبوەو لاوێکی لێدێتە دەرەوە لەنێوان جێنشینانی زەویدا دوژمنایەتی دەکەوێتەوە، ئەگەر پیاوێکی پیری لێهاتە دەرەوە ڕووداوێکی شەڕەنگێزو خراپ لەزەویدا ڕوودەدات ، ئەگەر دڕندەیەك هاتە دەرەوە بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی دەستەلاتدارێکی ستەمکار، ئەگەر مارێکی لێهاتە دەرەوە سزاو خەشمێکی هەمیشەییە لەو شوێنەدا.
*ئەگەر زەوی درزو قلێشی بردو ڕووەك سەردەرهێنا پیتو فەڕ دەڕژێت بەسەر دانیشتوانەکەیدا.
*ئەگەرر بینی زەوی هەڵدەکەنێ‌و لێی دەخوات ماڵ‌و دارایی بەفێڵ دەستدەکەوێت ، چونکە چاڵ هەڵکەندن فێڵ‌و تەڵەکەیە.
*ئەگەر بینی زەوییەك قلێشبوو بەڕووەك‌و بەگومانی خۆی ئەو زەوییەی بەموڵك‌و جێی خۆی داناو دڵخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی حەزو ئارەزووەکانی‌و مەرگێکی کتوپڕو خێرا

بەبەلگەی فەرمایشتی خودا ﴿حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً﴾ (الأنعام:٤٤).

*ئەوەی بەدەست بەسەر زەویدا بڕوات دەستەلاتو مولکی دەستگیر دەبێت، هەروەها وتراویشە: ئەگەر ڕۆیی بەسەر زەویدا میراتی بۆ بەجێدەمێنێت، تەنگەبەری زەویش دەستکورتیو کەمی بژێوییە.

*ئەوەی ببینیٚ زەوی بەخێروچاکە دەدوێت لەگەڵی خێروچاکەی لەئاینو دنیادا بەدەست دەکەوێت، وتەو قسەی نادیاریش ماڵو دارایيەکی گوماناوییە.

*ڕۆچوونو داچوونی زەوی نەمانی نازو نیعمەتو گۆڕانی حاڵو بارە.

*ڕۆچوون لەزەویدا بەبێئەوەی هەڵیبکەنیٚ زۆر دوورکەوتنەوەو ئاوارەییە بەهۆی سەرقاڵیو داواکاری دینارە یان مردنە لەپێناوی دنیادا، ئەگەر لەچاڵێکی بچووکدا ڕۆچوو هیچ دەروازەیەکی تێدا نەبوو فێڵی لێدەکرێت لەکاروبارەکانیدا بەئەندازەی خۆی.

*هەرکەسێك بینی لەشوێنو جێگەیەکدا ڕاوەستاو ڕۆدەچێت بەناخی زەویدا ئەگەر بەرپرسو فەرمانڕەوابوو دنیا ئاڵو گۆڕ دەکات لێیو هاوڕێکەی دەبێت بەدوژمنی، شادمانیو کەیف خۆشی لێدەبێت بەغەمو پەژارە بەپێی وتەی پەروەردگار ﴿فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الْأَرْضَ﴾(القصص: ٨١).

*ئەگەر بینی گەڕەكو زەوییەك لەخەڵكی هاتەوە یەك لەوشوێنو جێگەیەدا مردن دەکەوێتەوە، یان وتی وتیو هەراو بەزمو کۆمەڵێك سەریان تیا دەچێت بەئەندازەی هاتنەوەیەکی زەوییەکە، یاخود نەبوونیو دەستکورتی دێت بەسەریا، ئەگەر ئەوەی پێچرایەوە لەزەوی بەتەنیا لەخۆی بوو نەبوونیو تەنگی بژێوی ڕووی تێدەکات، بەلام ئەگەر بینی ئاوەلابوو بۆی هاتەروو تەمەنی درێژ دەبێتو خێر ڕووی تێدەکات.

*(نابلسی) دەڵێت: زەوی لەخەودا لێکدانەوەی هەیە، هەرزەوییەکیش بەپێی خۆیو ناوەڕۆکی، ئەگەر زەوی لەسەر پشتی نەهەنگو گایەك بینیەوەو هیچ نەگۆڕابوو بەلگەیە لەسەر پادشایەك دەستبەرداری مولکو دەستەلاتدەبێت، یان جێگرەکەی لادەباتو حاڵو باری جیهان هیچ گۆڕانکارييەکی بەسەردا نایەت.

* زەوی‌و ماڵ بەڵگەیە لەسەرنەوەی لەسەری رادەخرێ لەراخەرو فەرش‌و حەسیرو هیتر، یان ئەوەی چاکسازی تێدا ئەنجامدەدات ، یاخود ئەو خزم‌و کەس‌وکارەی تیا کۆدەبنەوە ، ئەوچاکەو خراپەیەی دەیبینێ ئاوزەنگی دەبێت بەڵگەو نیشانەیە لەسەری ، بەڵام زەوی کشتوکاڵی بەڵگەیەلەسەر کێڵان‌و کشتوکاڵکردن تێیداو فەرو پیت‌و بێبەروبوومی ئامرازی کێڵان‌و دوروێنەو کشتوکاڵەو ئەوەی تێدا روودەدات لەبۆنی خۆش‌و گوڵ‌و رووناکی‌و ئاودان‌و بەرزی‌و نزمی‌و رەقی‌و زبری دەگەڕێتەوە بۆئەوەی باسمانکرد.

* بەڵام زەوی گەرم بەڵگەیە لەسەر گەشت‌و گەڕان‌و سەفەر تێدا بەمەبەستی بازرگانی‌و بژێوی پەیداکردن وەك سەرقافڵەچی‌و کاروانچێتی‌و هاوچەشنەکانی، نەمانی کۆسپ‌و رێگرەکانی‌و دەرهێنانی بەردەکانی‌و دەرخستنی رێگەو بانی‌و جێگیربوون لەسەری لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانج بۆ گەشتەوان‌و، ئاسانبوونی کاروبارەکانی‌و رەواندنەوەی غەم‌و پەژارەو گورج‌و گۆڵی کاروانەکەیان.

* بەڵام زەوی ناسراو بەڵگەیە لەسەر خاوەنەکەی بەگرتن یان میراتی یان هەڵکەندن، ئەو قووڵی‌و کورتیەی تێدا روودەدات دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی هەروەك باسمانکرد.

* زەوی نادیاریش: بەڵگەیە لەسەر دایك‌و باوك‌و ژن‌و پیاو شەریك‌و دەستپاك‌و میراتگر، هەروەها بەڵگەیە لەسەرنەوەی خاوەن ماڵ‌و ئاژەڵ‌و دایکە یان ئەوەی لەسەری دادەنیشێت لەراخەرو کورسی‌و...هتد

* هەروەها زەوی بەڵگەیە لەسەر رۆڵی داوێن پیسان‌و ئارەزووەکان.

* زەوی ژنێکی دووزمانە کەهیچ نهێنیەکی بۆ ناشارێتەوە.

* هەروەها زەوی بەڵگەیە لەسەر دەمە دەمەو زانیاری‌و رەوانبێژی‌و ، بەڵگەیە لەسەر دنیاو ئاسمان‌و دوارۆژ.

* دەگونجێت زەوی‌و ئاسمان بەڵگەبێت لەسەر دوو ژنی سەراسەرو هەویەی یەك ناتوانن هەرگیز لەگەڵ یەکدا بژین یان کۆببنەوە مەگەر خودا یەکیان بخات.

* ئەگەر بینی زەوی شەقیبردووە بەڵگەیە لەسەر بیدعەو دەرخستنی گوناە و کاری نابەجێ، دەگونجێت درزو شەق بردنیشی بەڵگەبێت لەسەر باشی‌و فەرو پیتداری.

*درێژی زەوی و گوشادبوونی بەڵگەیە لەسەر ئازادبوونی زیندانی و منداڵبوونی دووگیان، درێژبونەوەی وەك سروشتی خۆی رزق و رۆزییە.

*ئەگەر بینی خاوەن زەوییەکی لووس و سافبوو ژنێکی هەژارو نەزۆك دەبێت بەهاوسەری.

*دەگونجێت زەوی بەڵگەبێت لەسەر موڵك لای دەستەلاتدار یان مەرگو ژیان و رزق و رۆزی لەگەڵ ئەوانەی ئیش وکاری لەسەر دەکەن لەپیاوچاك و خراپ.

*ئەگەر بینی بوە بەخاوەنی زەوییەك ژندەهێنێت و خوداوەند کوڕێکی پێدەدات یان دەبێت بەهاوبەشی کەسێك یان کەسێك بەئەمین دادەنێت بەسەر ماڵ و نهێنیەوە، یاخود میراتیەکی بۆ دەمێنێتەوە یان ماڵێك بەکرێ دەگرێت یاخود دەیفرۆشێ، یان ئاژەڵێك دەکرێت یان راخەرێك ، هەریەك بەپێی توانای خۆی و ئەوەی شیاوە لەگەڵی.

*ئەگەر شیاوی دەستەلات بێتبوو پێدەبەخشێ، ئەگەر نەخۆشبوو ساغ و تەندروست دەبێتەوەو پێشوازی لەبژێوی خۆیدەکات.

*ئەگەر زەوییەکە گوشادو بەرینبوو هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا جوان و رازاوەبوو دڵی کەمەندکێشدەکرد کردارەکانی لەسەر ئەو زەوییە باش و چاکدەبن ، بەڵام ئەگەر کەلاك و ئێسکی پرووکاوی لەسەربوو لەگەڵ پیس و پۆخڵی کردارەکانی لەسەر ئەو زەوییە خراپ و نالەبارە دەبێت.

*ئەگەر زەوی گفتوگۆو وتوێژی لەگەڵ سازکرد یان لەوتەکانی حاڵینەبوو، بەڵگەیە لەسەر ناڕەحەتی و لەرزەو ئابڕووچوون.

*ئەگەر بینی زەوی تووشی زەمین لەرزە هات و خۆی لەسەری بینیەوە ، بەڵگەیە لەسەر منداڵبوونی دووگیان و دانانی بارەکەی.

*ئەگەر بینی زەوی دانیشتوانی نغرۆکرد بەڵگەیە لەسەر وێڵی و سەرگەردانی و لەخۆرازیبوون و بێئاگایی لەگوێڕایەڵی خوداوەند.

*ئەگەر زەوی پێچرایەوە لەژێریدا بەڵگەیە لەسەر تەواوبوونی کارەکەی یان تەلاقدانی هاوسەرەکەی، یان لەکیسچوونی پۆست و دەستەلات.

*ئەگەر بینی زەوی گۆڕاوە بۆ چاڵ و ئاسن و کون دەگونجێت ئەستەم و مەحاڵبێت هاوسەرەکەی دووگیان بێت

یان پیشەکەی بگۆڕێت یان بەڵگەبێت لەسەر بەدەستهێنانی ماڵو سامان بەهەوڵو کۆششی خۆی ، یان کانزایەك بدۆزێتەوە.

*ئەگەر بینی خۆیبوە بەزەوی پلەوپایەی بەرزدەبێتەوە لەنێو خەڵکیدا یان خۆی ئامادەدەکات بۆ وەرزشو شکاندنی نەفس.

*ئەگەر زەوی هەلگرتو هیچ کێشێکی نەبوو بەڵگەیە لەسەر ستەمی کەسیتر لەوزەوییەی ئەودا، یان مەزندەبێتو زەوی دەوروژێنێو دەیخاتە سەرپشتیو یارمەتی دەدرێت لەسەر ئەوکارە ، یان دەبێت بەکەسێکی شارستانی یان مولکدار.

*ئەگەر زەوی خوارد بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەکەسێکی نەزانەوە سوودو قازانجی دەستدەکەوێت یان سوودی پێدەگەیەنێت.

*دەگونجێت ئەوەی لەسەری دانیشتوە یان سواریبووەو قاچی پێدا هەڵدەگرێت بفرۆشێو نرخەکەی بخوات.

*ئەگەر بینی زەوی شەقیبردو قووتیدا بەڵگەیە لەسەر شەرمو نەبوونی هۆکار، یان دەگونجێت سەفەر بکاتو زیندانی بکرێت یان منەتباری یەکێك ببێت.

*ئەوەی ببینێ لەسەر زەوییەکی فراوانو بەرینەو شارەزانیەتێیداو لەبیابان دەچێت سەفەرێکی کتوپڕ دێتەرێی.

*ئەوەی ببینێ لەسەر زەوی دانیشتوەو شتێکی بەدەستەوە گرتووە بۆ بازرگانی سەفەر دەکات.

*ئەوەی ببینێ لەزەوییەکدا خەریکی خواردنە ماڵو داراییەك بەدەستدێنێت بەئەندازەی ئەوەی لێیخواردوە.

*ئەوەی ببینێ لەزەوییەکی وشکەوە دەچێت بۆ زەوییەکی بەفەڕو پیتەوە لەبیدعەوە دەچێت بۆ سوننەت ، خۆئەگەر لەزەوییەکی بەفەڕو پیتووە بچیت بۆ زەوییەکی وشكو بێ فەڕو پیت پێچەوانەی پێشووە.

*ئەگەر بینی ئالوودەی سەفەرەو لەزەوییەکەوە دەچێت بۆ زەوییەکیتر، سەفەر دەکاتو حالی لەسەفەردا بەئەندازەی خەوەکەی دەبێت لەرووی فراوانیو تەنگەبەریو بەپیتیو بێپیتی.

*ئەگەر بینی دەستەلاتداری ولاتێك لێیدوورکەوتەوە ئەگەر ژنی هەبوو تەلاقیدەدات یان ژنێکی دی دەهێنێت.

*ئەگەر بینی زەوییەکی فرۆشتو بەجێیهێشت گەر نەخۆشبوو دەمرێت، ئەگەر دەوڵەمەندبوو هەژار دەکەوێت.

* ئەگەر بینی قاچی هەڵخلیسکا بەسەر زەویدا یان دەستی خۆڵاوی تەکاند هەژار دەکەوێت ، بەلأم ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێتو دەگەڕێتەوە بۆ نێو ئامێزی گڵو خاك.

* ئەوەی ببینێ لەسەر زەویدا وندەبێت بەلأم هیچ چاڵێکی نەبینی سەفەرێکی بژێوی پەیداکردن دێتە ڕێیو تێدا دەمرێت.

* ئەوەی ببینێ زەوی دەپێچرێتەوە بەخێرایی دەمرێت.

* ئەوەی ببینێ زەوی قلّیشو درزیبرد بۆی تەمەنیدرێژ دەبێت.

* ئەوەی ببینێ لەزەویەکەوە دەچێت بۆ یەکێکی دی بەدوایەکدا دەچێتە لای ژنەکەی یان سەفەرەکەی درێژخایەندەبێت لەزەوییو خاکێکەوە بۆ یەکێکی دی.

* ئەوەی ببینێ زەوی قووتیداوەو نغرۆبوە تێیدا ئەگەر لەخەڵکی شەڕەنگێزو خراپبێت سزایەك دادەبارێت بەسەریا یان سەفەرێکی دوور دێتە ڕێیو دەترسێت نەگەڕێتەوە.

* ئەوەی ببینێ زەوی تووشی زەمین لەرزە دێتو ڕۆچوو بەلأیەك دێت بەسەر ئەو شوێنەدا لەلایەن فەرمانڕەوا یان بەهۆی گەرماو سەرما یان نەبوونیو قاتیو قرییەوە، یان ترسو بیمێکی توندو تیژ.

* ئەوەی ببینێ زەوی درزو قلّیشی بردو ئاژەڵێکی لێهاتە دەرەوە کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکیدا ڕووداوێکی سەرسام دێتە ڕێی، یاخود دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نزیکبوونەوەی ئەجەلو چارەنووسی، یان نیشانەو بەڵگەیەکی مەزن بێت بۆ سەرجەم خەڵکی تا پەندو ئامۆژگاری وەربگرن.

* زەوی بەڵگەیە لەسەر دنیا، ئەوەی دەبێتە خاوەنی بەئەندازەی فراوانیو گەورەییو تەنگیو بچووکی دەبێت بەخاوەنی.

* زەوی ناسراو بەڵگەیە لەسەر شار کەخۆی تێدا دەژی لەگەڵ ماڵو خێزانو دانیشتوانیدا.

**زەوی کێڵەر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: کەسێکە فرە سەرقاڵە بەئیشوکارەوە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە باشترین ئیشوکار ئەنجام دەدات بەتایبەت ئەگەر کشتوکاڵەکەی رواو سەوزبوو و دوورییەوە.

* ئەگەر لەوانەبوو کاروکرداری دەدرایە پاڵ تەوبەدەکات.

*ئەگەر بەلگەبێت لەسەر دنیا خێرو فەرِوپیتو چاکەیە.

**زەوی هەلکەن:** (ئیبن سیرین)دەلێت: زەوی هەلکەن پیاوێکی فێلبازو دەستبڕە هەتا دەگاتە ئاو ئەگەر گەیشتە ئاو دەیبەستیّو زەوی هەلکەندنیش لەبنەڕەتدا فێلّو تەلەکەیە.

*چیا هەلکەن پیاوێکە هاوەلایەتی لەگەلّ پیاوانی گەورەو مەزندا دەکات.

*هەروەها وتراوە: زەوی هەلکەندن پیاوێکە لەناخۆشیو دەردەسەریدایەو بەدرێژایی تەمەن لەو حالّو بارە قوتار نابێت.

*ئەگەر بینی خاكو خۆلّ هەلدەکەنێت لەشتی پرِوپووچو بێمانایا کاتی بەگەڕ دەخات. هەروەها گوتراوە زەوی هەلکەن پیاوێکی داخ لەدلّی فێلبازە.

(نابلسی)دەلێت: بیر هەلکەن یا ئەوەی لەچیاو شاخەکان چالّ هەلدەکەنێت پیاوێکی توندە لەفێلّداو رقو کینەو دژایەتی پەنهانکردوە، ئەگەر پاداشتی لەسەر وەرگرت پیاوێکی فێلبازو دەستبڕە چونکە هەلکەندن فروفێلّە، شوێنی هەلکەندنو راویش بەلگەیە لەسەر زینندانو شاردنەوەو پەنهانی کاروباری ناقۆلاو خراپ.

**زەیت:** (ئیبن سیرین) دەلێت: ئەگەر بینی زەیت دەخواتەوە بەلگەیە لەسەر جادوو یان نەخۆشی.

(نابلسی) دەلێت: لەخەودا رزقو رۆزیو مالّی حەلالّو شیفایە بۆ یەکێك خۆی پێچەوربکات.

*زەیتی زەیتون زانیاریو فەڕو بەرەکەتو رووناکیو رزقو رۆزی حەلالە بەدەر لەزەیتی زەیتون مالّو داراییەکە گومانی تێدا نییە یاخود مالێکە دەگەرِێتەوە بۆ فەرمانڕەوا.

*دەگونجێت زەیت بەلگەبێت لەسەر رووناکی چاو یاخود نوری دلان.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر دیاریکردنی مندالان یاخود رووداني شکان.

*دەگونجێت زەیت بەلگەبێت لەسەرئەوەی نزیکدەبێتەوە یان پەیماندەدات، ئەگەر زەیتی باش خراپبوو بەلگەیە لەسەر شکانی بەلێنو پەیمان، ئەگەر زەینی خراپ باشبوو بەلگەیە لەسەر باشی مامەلەو دلنیایی.

**زەیتون:** (نابلسی) دەلێت: لەخەودا مالّو خۆشڕابواردنە ، داری زەیتون پیاوێکی پیرۆزی فەرِدارە بۆ خانەوادەکەی.

*هەروەها دەڵێن: زەیتون ژنێکی ڕێزدارە یاخود کوڕی سەرکردەی فەرمانڕەوایە.

*زەیتونی زەرد غەمو پەژارەیە لەئایندا.

*ئەوەی زەیتون بگوشێ لەدارەکەی خێرو فەڕی دەستگیر دەبێت.

*هەروەها دەڵێن: زەیتون غەمو پەژارەیە بۆ یەکێك بیبینێ.

*گەڵای زەیتون دەستگرتنە بەرێبازی پتەوو تۆکمەوە.

*هەروەها گەڵای زەیتون بەڵگەیە لەسەر پیاوچاکان یان باشترین خەڵكو بەروبوومەکەی بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزی ئاسانو نیعمەتی باش لەگەڵ خۆشحاڵی تەواو.

*ئەگەر بینی زەیتون خۆشدەکات یاخود دەیگوشێ بەڵگەیە لەسەر ماندبوونو هیلاکی.

*زەیتون بۆنەخۆش بەڵگەیە لەسەر هێزو توانایان، هەروەها بەروبوومی زەیتونیش بەوچەشنەیەو گەڵاکانی بەڵگەیە لەسەر جێگیربوونی کردارەکانو چاکبوونەوەی نەخۆش.

*زەیتون بەڵگەیە لەسەر:

+ڕووناکی باوەڕو ڕێنومایی بۆ سەرپێچیکارانو زانیاریو قورئانخوێندن.

+قاچگرتنەوە بۆ قاچشکاو.

+گوێڕایەڵی بۆ منداڵ.

+ماڵو دارایی بۆ هەژار.

+ئەو لایەی زەیتونەکەی لێوەدێت.

## زی

**زیادکردنی بەنزین:** (ئەبو حەفس) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا ببینێ خێرایی ئوتومبیلەکەی زیاد دەکات بەدەستهێنانی سوودو قازانجە یاخود بەدیهێنانی هیوایە بەهۆی رەنجو تێکۆشانەوە یاخود ڕووکردنە خراپەو هەڵەیە ئەگەر خراپیو ناتەواوی تێدا ڕوویدا.

**زیان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: زەرەرو زیانو گوناهو تاوانە.

(نابلسی) دەڵێت: بۆیەکێك بۆیڕوون نییە لەشتێکدا سوودی تێدا بکات بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی بیروباوەڕو بێباوەڕی دوای ڕێنومایی.

**زیك زیکە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دوژمنی لاوازە یا سوپاو سەربازی بێئەمەك بێوەفایە یاخود پیاوێکی زمان پیسی راماوو لاوازە.

*ئەوەی ببینێ زیك زیكە دەوریداوە نەتەوەو كۆمەڵێكی درندە دەوری دەدەنو خەمو خەفەت رووی تێدەكات.

*ئەوەی ببینێ بەربەرەكانی لەگەڵ زیك زیكەیەك دەكات بەربەرەكانی لەگەڵ كەسێكی لاواز دەكات.

*ئەوەی ببینێ زیك زیكەیەك دەچێتە نێوگەرووی‌و دەكاتە نێوسكی تێكەڵ بەمرۆڤێكی لاواز دەبێت‌و خێروچاكەی لێوە دەستدەكەوێت‌و لەگەڵ شادیی‌و خۆشیەكی كەمدا.

**زین**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ژن.

*بەڵگەیە لەسەر ژنێكی داوێنپاكی جوان‌و دەوڵەمەندە.

*دەگێڕنەوە ژنێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: خۆم بەسەرپشتی ئاژەڵێكەوە بینیەوەو توندبووم لەتەنگەلأنێك‌و هەرزینەكەی تیامایەوەو ئنجا منو ئاژەڵەكە قوتاربووین . (ئیبن سیرین) وتی: تۆ پیاوێكی خراپیت ، كاروبارێك دێتە پێشەوە بۆت ژنەكەتی تێدا ملكەچ‌و رسوا دەكەیت، زۆری نەبرد ئەو پیاوە لەگەڵ ژنەكەی سەفەریانكردو دزو جەردە رێگەیان پێگرتن‌و ئەویش ژنەكەی لەبەردەستی دزەكاندا بەجێهێشت‌و خۆی قوتاربوو.

*هەروەها دەڵێن: زین بەدەستهێنانی ماڵێكی كەمە یاخود بەدەستهێنانی دەستەلأت‌و پلەوپایەیە، یان دەڵێن: سوودوەرگرتنە لەئاژەڵ.

*هەندێكیتر دەڵێن: ئەگەر بینی سواری زینێكبوە لەكاروبارەكانیدا سەركەوتوو دەبێت.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سێ ژن دەهێنێت، هەروەها هێلانەی دوورەگە.

*ئەگەر بینی سەگ یاخود بەراز یا گوێدرێژ سواری زینەكەیبوە كەسێكی ناپاك خیانەت‌و ناپاكی لێدەكات‌و لەگەڵ هاوسەرەكەیدا.

*زین ئاژەڵە یان دەستەلأتدار یا ژنێكی رێزدار خاوەن شۆخ‌و شەنگی‌و جوانییە.

*هەروەها دەڵێن: زین ماڵ‌و دارایییە، ئەگەر بینی زینەكەی شكا تیاچوونییەتی.

*ئەگەر بینی زینەكەی شكا تیادەچێت یاخود هاوسەرەكەی دەمرێت.

*ئەگەر بینی زینەكەی دادەگرێ ژنەكەی لەئەستۆی خۆیدەكاتەوە یاخود تەلأقیدەدات یان ئەوەی لەژێر دەستیدایە تیادەچێت‌و خراپە رووی تێدەكات.

*ئەگەر خشتی لەسەر زینەکە بینی زیان بەژنێك دەگەیەنێت لەلای خۆی.

**زینا(داوێنپیسی)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی زینادەکات ناپاکیو خیانەتدەکاتو وتراوە: خوداوەند (حەج)ی لەچارە دەنوسێت.

*هەروەها دەڵێن: زیناکردن لەگەڵ ژنی پیاوێکی ناودارا داواکردنی ماڵی ئەو پیاوەیەو چاوتێبڕینیەتی.

*زیناکار لەگەڵ ژنی جەحێڵو لاودا دانانی ماڵو دارایی‌کەیەتی لەکاروبارێکی گونجاوی سەقامگیرو پارێزراودا ، ئەگەر سزای زینا پیادەکرا لەسەر ئەو زیناکارە بەڵگەیە لەسەر تواناداری لەدەستەڵاتدا.

*ئەگەر بینی دوو زیناکار - ژنو پیاو - بەیەکەوە گرێدەداتو ژنی زیناکار نابینێ پیاوێکی دەڵاڵەو کاڵایەك دەخاتە روو ئەستەمە بەدەستی بهێنێت، بەڵام خۆ چواندنی ژن بەپیاو، ئەگەر ژنێك بینی جلوبەرگی پیاوی پۆشیوە حاڵوباری باشدەبێ ، ئەگەر ئەندازەی خۆی نەبەزێنێ ، ئەگەر جلوبەرگەکە لەئەندازەی خۆی دەرچوو حاڵوباری دەگۆڕێ لەگەڵ ترسو بیمدا، ئەگەر بینی بوە بەپیاو بۆ مێردەکەی باشدەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: ژنی زیناکاری نادیار خێروچاکەیەو بەهێزترە لەژنی ناسراو ، زینا دزییە چونکە زیناکار وەك دز خۆیدەشارێتەوە، ئەوەی ژنێکی زیناکار ببینێ رووی تێدەکاتو هانیدەدات کاری ناڕەوای لەگەڵ ئەنجامدەداتو بکات ماڵو داراییەکی حەرام بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی زینا لەگەڵ ژنی ناسراوێکدا دەکات دەیەوێت شتێك لەماڵەکەی ببات.

*ئەگەر لەخەودا ئایەتی: ﴿الزانية والزاني﴾ (النور: ٢) بخوێنێتەوە زیناکارە، هەروەها ژنیش بەوچەشنەیە ئەگەر ئەو ئایەتە بخوێنێتەوە.

*ئەوەی مامەڵە لەگەڵ ژنێکی زیناکاردا بکات لەخەودا دنیاو خوازیارانیەتی، ئەگەر دنیاخوازان ناسرابوون بەچاکیو ئاینو زانیاریو سیفەتی چاكو پێکهاتەی پیاوچاکانو بینینان روودەکەنە ژنێکی زیناکارو کاری زینای لەگەڵدەکەن روو لەبەدەستخستنی زانیارییەك دەکەن لەلایەن زانایەكو بەئەندازەی نزیکبوونەوەیان لەو ژنە زانیاری بەدەستدەهێنن.

*ئەگەر پیاوێکی بینی لەگەڵ ژنێکدا ئەو پیاوە خوازیاری دنیای ئەو ژنەیە.

*ئەگەر بینی زینادەکات ڕێورەسمەکانی (حەج) ئەنجامدەدات.
*ئەگەر بینی زینا لەگەڵ ژنێکی داوێنپیسدەکات شەڕو فیتنەو ئاشوب بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر بینی چوە شوێنو جێگەی زیناوەو نەیتوانی بێتەدەرەوە بەخێرایی دەمرێت.
*ئەگەر بینی لەگەڵ ژنی کەسێکی تردایەو مێردەکەشی لەگەڵیدایەو هیچ نکوولییەکی لێناکات ئەو مێردە لەکاروبارێکی ماڵەکەیدا رایدەسپێرێ.
**زیندان**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەحەمام بەڵگەیە لەسەری، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشیەك ڕێگربێت لەجموجوولی خانەوادەکەی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+وەستانو ڕێنەکەوتنی سەفەر.
+گۆڕ.
+دۆزەخ.
+زیندانو شوێنی تاوانباران.
*ئەگەر خۆی لەزیندانا بینی تەماشای حاڵی خۆیو زیندان بکە، ئەگەر نەخۆشبوو زیندانەکەش نادیاربوو گۆڕەکەیەتی تا ڕۆژی قیامەت تێدا بەند دەکرێ.

*ئەگەر زیندانەکە ناسراوبوو نەخۆشیەکەی زۆر دەخایانێتو ئومێدەواری چاکبوونەوەی دەبێ.
*ئەگەر نەخۆشەکە تاوانباربوو زیندانی نادیار گۆڕەکەیەتیو زیندانی ناسراویش بەڵگەیە لەسەر زۆرمانەوەی لەو نەخۆشیو بیمارییەی تووشی دەبێتو ژیانی وەبەرنایەت هەتا تەوبەنەکاتو قوتار نەبێت لەنەخۆشی.
*ئەگەر مردوویەکی بینی لەزیندانا، ئەگەر بێباوەڕبوو بەڵگەیە لەسەر دۆزەخ، ئەگەر موسوڵمانبوو لەدەرکی بەهەشت بەنددەکرێ بەهۆی گوناهێکەوە هێشتا لەسەری دەمێنێت، بەڵام کەسێکی زیندووی لەش ساغ ئەگەر خۆی لەزیندانا بینیەوە لەوشکانی یاخود نێو کەشتیەکدا کۆسپو ڕێگر دێتە ڕێی لەبارانو باو دوژمنو جەنگ یان بڕیاری دەستەلآتدارێك ، ئەگەر لەسەفەردا نەبوو دەچێتە شوێنێکەوە تێدا بێگوێی خوداوەند دەکات وەك بارو شوێنێك داوێنپیسی تیا ئەنجامدەدرێت یا مەیخانەیەك هەرکەس بەپێی خۆی.
*هەندێکدەڵێن: ئەگەربینی زیندانێکی بۆ خۆی هەڵبژارد ژنێك بانگیدەکات بۆ کاری داوێنپیسی بەڵام خوداوەند ئەو

کارەی لێدووردەخاتەوەو دەیگەیەنێ بەهیوای خۆی بەپێی وتەی پەروەردگار: ﴿قال رب السجن أحب الي مما يدعونني اليه﴾ (يوسف:٣٣).

*هەروەها دەگێڕنەوە (سابور)ی کوڕی (ئەردەشێر) لەژیانی باوکیدا دەبینێ وەك ئەوەی زیندان دروستبکاتو بەرازو مەیمون لە(ڕۆم)وەرگرێو لەزیندان بەندیان بکات، خۆشی خاوەن (٣١) تاج دەبێتو لەراقەکارێکی خەو دەپرسێ ئەویش لەوەڵامدا دەڵێ: (٣١)ساڵ تۆ فەرمانڕەوایی دەکەی، سەبارەت بەدروستکردنی زیندانیش بەئەندازەی ئەو زیندانانە شار دروستدەکەیو (روم) دەگریتو ئەسیریاندەکەی.خەونەکەی بەو چەشنەبوو دوای مردنی باوکی پاشای (روم)ی گرتو شاری (نیشابور)و (ئەهوان)و (خاوەران)ی دروستکرد.

(نابلسی) دەڵێت: زیندان بەڵگەیە لەسەر دەستگرتن بەئاینەوە، ئەگەر زیندانی شەیتانبوو بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە بەهۆی زەمو دوورییەوە.

*زیندانی نادیار بەڵگەیە لەسەر دنیا.

*زیندان بەڵگەیە لەسەر هاوسەری بۆڵەبۆڵکارو هۆکاری هیلاککار، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بێدەنگیو زیندانی زوبان لەقسەی هەڵەتو پەڵەت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+پلانو ناپاکی دوژمنان.

+تاوانبارکردنو نزیکبوونەوە لەگەورەپیاوان.

+گۆڕوئاین.

+دانیشتنو سەفەر نەکردن بەهۆی نەخۆشییەوە.

+کورتیو نزمی هیمەتو خواز.

+هەژاریو پشوونەدان.

*ئەگەر زیندانیەك بینی دەروازەکانی زیندان ئاوەڵان لەزیندان ئازاد دەکرێ، هەروەها ئەگەر چاڵێکی تیا بەدیکردو رووناکی لێوە هاتە ژوورەوە یان سەربانەکەی بینی لاچوو ئەستێرە بەدەرکەوت زیندان لەشساغیو سەلامەتی موسافیرو گەشتیارو مەرگی نەخۆشە.

*ئەگەر بینی لەزیندانی دەستەلاتدارێکدایەو بەتوندی دەرگاو دەروازەکانی لێداخراوە کارەساتێکی دڵتەزێن رووی تێدەکات یان لەغەمو پەژارەدا دەبێ قوتاربێ لێی.

*ئەگەر بینی لێی بەدەرکەوت لەو غەمو پەژارەیە قوتار دەبێ، ئەگەر

لەسەفەردابوو بێئاگاییە، ئەگەر نەخۆشبوو نەخۆشییەکەی درێژە دەخایەنێت.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی لەزینداناییە دوعاکەی گیرایەو لەغەمو پەژارە قوتار دەبێت بەپێی چیرۆکی (یوسف)(سەلامی خوای لێبێت).

*ئەگەر بینی لەزیندانێکی نادیاردایە لەگەڵ خانەوادەکەی و لێی بەدەرناکەوێت گۆڕەکەیەتی.

*ئەگەر بینی لەزیندانێکی نادیار بەدەردەکەوێت یان لەماڵێکی تەنگەبەر روو بەشوێنێکی فراوانو گوشاد، ئەگەر نەخۆشبوو یاخود بەلاو نەهامەتی رووی تێکرد دەرووی لێدەکرێتەوە.

*ئەگەر بینی لەماڵەکەی خۆیدا بەسترابوەوە خێر رووی تێدەکات یان لەنێوخانەوادەکەی دەبینێ.

*ئەگەر بینی لەماڵێکی نادیاردا زیندانیکرا هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکدا دەکات سوود لەماڵو سامانو منداڵی وەردەگرێ.

*ئەگەر بینی بەسترابوەوەو لەنارەحەتیدابوو لەوەی لێی دەترسێ قوتاردەبێ.

*ئەگەر بینی زیندانەکەی بینا دەکات چاوی دەکەوێ بەپێشەوایەکی رێنومایيکراو خەڵکی ئەو گەڕەکە رێنموویی دەکەن بۆ رێبازێکی باشو چاك.

**زیندروو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: زیندروو بازرگانی مرۆڤە چونکە زیندروو ژن یان کچە.

(نابلسی) دەڵێت: زیندرووی ئاژەڵ بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری بۆ کەسی رەبەنو بەدەستهێنانی پلەوپایەو بەڵگەیە لەسەر سەفەرو گواستنەوە لەماڵێکەوە بۆ ماڵێکیتر، یان لەفرۆشگایەکەوە بۆ فرۆشگایەکیتر.

**زیندووبوونەوەی خەڵکی لەگۆڕەکانیان رۆژی قیامەت:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیەلەسەر بڵاوبوونەوەی خەڵکی لەبازاڕدا بۆ سوودوەرگرتنو کۆمەڵێ سوودو قازانجدەکەنو کۆمەڵێکیش زیان.

**زیوو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: زیوو ماڵێکی جەمکراوە زیوویش کچێکی سپی پێستی شۆخو شەنگە چونکە زیوو لەرەگەزی ژنانە.

*ئەگەر بینی زیووی تواوەی دەرهێنا لەکانەکەی پلاندەگێڕێ لەژنێکی شۆخو

شەنگ ، ئەگەر پارچەکە گەورەبوو کانزایەك بەدەستدەهێنیّ.

* ئەگەر بینی زیوو دەتوێنێتەوە ناکۆکدەبێت لەگەڵ ژنێکداو دەکەونە بەر زوبانی خەڵکی.

(نابلسی) دەڵێت: هەر شتێك لەزیوو دروستکرابێت لەدەفرو خشڵو هاوچەشنەکانی بەباشی یان شکاوی ئەگەر بینی شتێکی لێدەدات ماڵو سامانێك بەئەمانەت دادەنیّ ، هەروەها ئەگەر ئاوێنە لەزیوبوو ئەگەر تەماشای رووخساری خۆی نەکات ئەگەر تەماشایکرد خراپەی پێدەگات لەشانو شەوکەتیدا.

* تەماشاکردنی ئاوێنەی زیوو هیچ خێرێکی تێدا نییە.

* ئەگەر بینی چوە ئەشکەوتێكو بەزیوو رووپۆشکرابوو زیووی تەواوەی بەدەستهێنا ژنێك پلانی لێدەگێڕیّ.

* دەفرو قاچاغی زیوو و ئاڵتوون بازرگانییە بۆ خاوەنەکانی، یاخود کرداری چاکەیەو خاوەنەکەی دەباتە بەهەشتەوە، خوداوەند دەفەرمویّ: ﴿یطاف علیهم بصحاف من ذهب وأکواب ﴾(الإنسان: ١٥) دەفەرموێت: ﴿یطوف علیهم ولدان مخلدون (١٧)بأکواب وأباریق وکأس من معین (١٨)﴾ (الواقعة).

* بینینی دەفری جوانو ناشیرین تێکچوونو بیدعەو گومانە خەوبینەر لەسەریدەوەستیّ.

* خشڵی زینو شمشێر بەڵگەیە لەسەر ترساندنی دوژمنو ناچارکردنی حەسوودو دووڕوو.

* ئەگەر بینی دەفری زیو یان درهەمو پارەی رووپۆشکراوی نادیاری بەخشی کاروبارێك دەشارێتەوە یان شتێك با لەخوابترسیّو ئەمانەتەکە بگەیەنیّ.

* ئەگەر بینی دای بەکەسێکیتر نهێنیو ماڵێك لەلایدادەنیّ.

## زێ

زێ( ئەندامی زاوزێی مێینە ): (ئیبن سیرین) دەڵێت: زێی ژن دەرووڵێکردنەوەیە ئەگەر بینی ئاوروو بەزێی چوو کوڕێکی پێدەبەخشریّ.

* ئەگەر زێی بووبوو بەئاسن یان زێڕ بەڵگەیە لەسەر نائومێدبوون لەسەرگەیشتن بەویستوخواز.

* ئەگەر بینی چارەسەری زێی ژنێك دەکات بەبیّ ئەندامی نێرینەی خۆی دەروویەکی کورتی لێدەکرێتەوە.

*ئەگەر بینی گازی لەزێی ژنێکی نادیار گرت لەدنیادا کاروبارەکانی ئاوەڵادەبن و دەرووی لێدەکرێتەوە.
*ئەگەر زێی کچێکی بینی خێر رووی تێدەکات.
*ئەگەر دەستیدایە زێی ژنەکەی و لەزێربوو داوایەك لەژنەکەیدەکات کەنائومێد بوەلێی.
*ئەگەر زێی لەدواوەبینی خوازیاری خۆشەویستی و خێرە بەلام بۆ دوژمنەکەی دەبێت، ئەگەر زێی ژنەکەی بچووکبوو زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکەیدا ، ئەگەر گەورەبوو دوژمنەکەی زاڵدەبێ بەسەریا.
*ئەگەر بینی ئەندامی نێرینەی گۆڕا بۆ زێی ژن هێزو توانای نامێنێ.
*ئەگەر ژنەکەی ئامرازی نێرینەی هەبوو ئەگەر کوڕداربوو یاخود لەسکیدابوو گەورەدەبێ و سەرۆکایەتی و پێشەنگایەتی خانەوادەکەی دەکات، ئەگەر کوڕی نەبوو دووگیانیشنەبوو هەرگیز کوڕی نابێت، ئەگەر لەدایکبوو بەر لەبالغبوونی دەمرێت، یاخود دەگونجێت لێکدانەوەی بگوێزرێتەوە بۆ بژێوی پەیداکار یان خاوەنەکەی و باسکردنی بەپێی پلەوپایەیەتی.

*ئەگەر پیاوێك بینی عەورەتی ژنی هەیە ملکەچییە، ئەگەر بەو عەورەتەوە مارەکرا بکەر داواکە بەدەستدەهێنێ.
*هەروەها دەڵێن: گۆڕانی زێی ژن بۆ ئامرازی نێرینە بەلگەیە لەسەر پیسی زوبان و زاڵبوونی ئەو ژنە بەزماندرێژی بەسەر مێردەکەیدا.
*ئەگەر بینی زێی ژنێك دەمژێ دەرووییەکی خێری بەکەمی لێدەکرێتەوە.
*ئەگەر تەماشای زێی ژنێکیکرد بەئارەزووەوە بازرگانیەکی خراپدەکات.
(نابلسی) دەڵێت: زێی ژنان لەخەودا دەرووی خێرە بۆیەکێك لەنارەحەتیدابێت و بۆکەسێکی رەبەن هاوسەرگیرییەو بۆ موسافیر سەفەرەو بۆ شەریکێك کەوتنە بەسەر نهێنی و کاری شاراوەدا.
*زێی ژن ئەو ئەمانەتەیە کەناتوانرێ هەڵسوکەوتی پێوەبکرێ مەگەر بۆیەکێك ببێت بەخاوەنی.
*زێی بەلگەیە لەسەر زیندان یاخود دەرگای ماڵ کەخوداوەند فەرمانیکردوە لێوەی بچنەژوورەوە، خوداوەند دەفەرموێت: ﴿وأتوا البيوت من أبوابها﴾ (البقرة:١٨٩).

* زێ دوانگەو رووگەیە کەرووی تێدەکرێ.
* هەروەها بەڵگەیە لەسەر:
+نهێنی مرۆڤ.
+حەمام کەئاوو گەرماوو شوێنی پەشتەماڵی تێدایە.
+دۆڵو شیوی نێوان دوو شاخ.
+نەخۆشیو چارەسەر کەمرۆڤ پێی دەمرێو دەژی.
* هەروەها زێ بەڵگەیە لەسەر:
+گۆڕ یان تەنوور.
+فڕن.
+غەمو پەژارە.
+ئەوەی لەئەستۆیدایە.
+ئاگر یان ئەوەی پێیدەچێتە نێو ئاگرەوە.
+بار.
* ئەگەر لەنارەحەتیدابوو لەخەودا زێیەکی بینی لەنارەحەتیەکەی قوتاردەبێو پێداویستی بەجێدێت، ئەگەر سەفەریکرد پەشووی دەستدەکەوێ، دەگونجێت سووربێت لەسەر شەریکایەتی ئەوەی پەشوو بەدەستدەهێنێ.
* ئەگەر لەوانەبوو بەدوای نهێنیدا دەگەڕا یاخود بەدوای کانزایا بەویستو داوای خۆیدەگات، دەگونجێت پەیوەندی خزمایەتی بەجێبهێنێت، ئەگەر تامو چێژی لێوەرگرت بەماڵوسامانی ئەمانەتەوە هەڵسوکەوتدەکات.
* ئەگەر چوە لایو جووتبوو لەگەڵی دەگونجێت زیندانی بکرێ ، ئەگەر کاروبارێکی تێکەڵبوو بەهۆیەوە چاکدەزانێ دەکەوێتە نێو ئەوەی خێرو رێنومایی تێدایەو لەدەروازەی خۆیەوە دەچێت روو بەوکارە.
* ئەگەر خەوبینەر سەرپێچیکاربوو رێنومایی دەکرێ، ئەگەر وازی لەنوێژهێنابوو روو لەقیبلە دەکات یان ئامۆژگاری وەردەگرێ، ئەگەر خەوبینەر نەخۆشبوو نزیکدەبێتەوە لەلێواری مەرگ.
* ئەگەر جووتبوو لەگەڵ زێیەکدا لەخەودا دەگونجێت چەورییەك بخاتە نێو تەنور یا هەویر یان میوەیەکی سەیر بخوات یان خواردنێکی بەتامو چێژ.
* ئەگەر زێی ژنێکی ناسراوی بینی دەگونجێ ئاگاداری نهێنیەکانی بێت، ئەگەر بەشێوەیەکی جوان بینی حاڵی مێردەکەی یان کوڕەکەی باشدەبێ.

*زێ بۆ پیاوو ئامرازی نێرینە بۆ ژن بەڵگەیە لەسەر خراپی حاڵی پیاوو سووکیو رسوایی ژن.

*ئەگەر پیاوێك بینی زێی ژنی هەیەو غەمباربوو یان زیندانی قوتار دەبێت لێی.

*ئەگەر زێی ژنی بینیو دادگایی هەبوو یان دوژمنداربوو دوژمنەکەی ملکەچدەبێ شکستی پێدەهێنێ بەتایبەت ئەگەر مارەیبڕی.

*زێی پیر ئەگەر بازرگان بینی زەرەر لەبازرگانیەکەیدا دەکات.

*زێ فرۆشەری هەنگوینو خورماو مەیە چونکە جووتبوون وەك شیرینیو خواردن وایە.

*ئەگەر بینی چوە نێو زێی ژنێك کۆچی دواییدەکات.

*هەروەها دەڵێن: زێ پیاوێکی خوێنرێژی دەستبڕە بەرۆژ ملکەچی دەنوێنێو بەشەو خراپەو داوێنپیسی دەکات.

*زێ بەندەیەکی سووکو نزمەو لێدانی نەزانو جووتبوونە.

*زێ بەهێلانەی باڵندە لێکدەدرێتەوە.

*ئەگەر باڵندەی بینی یاخود بوو بەخاوەنی ژنێك دەکات بەهاوسەری خۆی.

*مووی زێ ترشییە یاخود هۆنراوەیەکە هێرشێکی توندی تێدایە.

**زێڕ**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: بەهۆی خراپی دەستەواژەکەیو رەنگی زێڕ لەلێکدانەوەدا باش نییە بۆیە زێڕ غەمو پەژارەو غەرامەیە.

*بازن ئەگەر لەدەستیکرد میراتییەکە دەکەوێتە دەستی.

*ئەگەر بینی پارچەیەك زێڕیکردوە بەخۆیدا دەبێت بەخزمی کۆمەڵێکی بێتوانا.

*ئەگەر زێڕێکی تواوە بەدەستبهێنێت ماڵو دارایی لەدەستدەچێت یاخود غەمو پەژارە بەئەندازەی ئەو زێڕە رووی تێدەکات یاخود دەستەلآتدارێك لێی تورەدەبێتو غەرامەی دەکات.

*ئەگەر بینی زێڕ دەتوێنێتەوە دەنگەدەنگو هەرا بەرپادەکات لەکارێکی نابەجیداو دەکەوێتە سەر زوبانی خەڵکی.

*ئەگەر بینی ماڵەکەی لەزێڕە ئاگر دەکەوێتەوە تێیدا.

*ئەگەر ملوانکەیەکی زێڕ یان زیوو یاخود موروو یا هەر مادەیەکیتر لەملیا بەدیبکات دەستەلآتێکی

پێدەبەخشریٚو ئەمانەتێکیشی ئەسپەردە دەکەن.
*ئەگەر دوو بازنی زێڕین یا زیو ببینیٚ خراپەیەك رووی تێدەکات ، زیو لەزێڕ باشترەو بازن هیچ خێرێکی تێدا نییە.
*پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "دووبازنی ئالْتوونیم لەدەستی خۆمدا بینی فووم تێکردن‌و کەوتن، یەکەمیان موسەیلەمەی درۆزنەو دووەمیش عەنەسی خەڵکی سەنعایە".
*ئەوەی پاوانەیەکی زێڕ یان زیوو ببینیٚ کردوویەتیە قاچی غەم‌و پەژارە یان زینداني‌و کۆت‌وبەند رووی تێدەکات.
*هەروەها دەڵێن: پاوانەی پیاو کۆت‌و بەندە، هیچ خشڵێك بۆ پیاو باش نییە لەخەودا بەلاْم هەموو خشڵێك بۆ ژنان جوانییە.
*دەگونجێت لێکدانەوەی بازن‌و پاوانە هاوسەربێت.
*زێڕ ئەگەر رێکنەخرابوو غەرامەیە ئەگەر رێکخرابوو شەڕی کەمترە.
*هەروەها دەڵێن: خشڵی ژنان بۆ ژن بەڵگەیە لەسەر منداڵ.
*دەگێڕنەوە ژنێك دێت بۆ لای راڤەکاری خەوێك‌و دەڵێت: لەخەودا بینیم تەشتێك زێڕم هەبوو لەبەرزاییەکدا کەوتمەخوارەوەو شکاو منیش بەسەرزەویدا گەڕام بەدوویدا بەلاْم نەمدۆزییەوە، راڤەکاری خەو لێی پرسی: خزمەتکاری نەخۆشت هەیە؟
وتی: بەڵیٚ، وتی: دەمریٚ.
*مرۆڤێك هەردووچاوی خۆی بینی لەزێڕە، راڤەکاریش پێی راگەیاند بینایی چاو لەدەستدەدات.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی پارچە زێڕێکی پێدرا دەستەلاْت‌و پلەوپایە بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر بینی زێڕێکی شکاو یان دیناری تەواو دەدۆزیتەوە رووخساری پادشا دەبینیٚ‌و بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە.
*ئەگەر بینی ماڵەکەی لەزێڕە دەسووتیٚ.
*ئەگەر بینی هەردوو دەستی لەزێڕە لەکاردەکەون.
*ئەگەر ینی چاوی لەزێڕە کوێردەبێت.
*بینینی زێڕ بەڵگەیە لەسەر:
+خۆشی‌و شادی‌و رزق‌و رۆزی.
+کرداری چاك‌و باش.
+رەواندنەوەی غەم‌و پەژارە.
+هاوسەرو منداڵ.
+زانیاری‌و رێنومایی.

+ئەوەی لەزێڕ دروستدەکرێ لەخشڵ.

*ئەگەر زێڕ لەخەودا بوو بەزیو بەڵگەیە لەسەر گۆڕانی حاڵوباری ئەوەی کەبەڵگەیە لەسەری لەژنانو ماڵو منداڵو خزمەتکارو بەردەست.

*زیویش ئەگەر بوو بەزێڕ بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵی ئەوەی بەڵگەیە لەسەری لەهاوسەرو خزمو کەسی نزیك.

*جلوبەرگی رووپۆشکراو بەزێڕ وەك سەرپۆشو لەچك ئەوانە هەمووی نزیکبوونەوەیە لەپەروەردگار بۆ ژنێك بیپۆشێتو بیدات بەسەریا.

*زێڕو زیوی پوختەش بەڵگەیە لەسەر:

+دڵسۆزیو پاکی نیەت.

+پەیمانبەستن.

+پەیمانی دروست.

*ئەوەی رووپۆشدەکرێ بەزێڕو زیوو یاخود دەکرێ بەخشڵ بەڵگەیە لەسەرکرداری کورتو گۆڕانی کاروبارەکانو مانگو لەبیرکردن.

*زێڕو زیوی بەکارهێنراو لەپارچەکانی خشڵدا رزقو رۆزی بەردەوامە، هەروەها مسو زەردیش بەوچەشنەیە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: زێڕو مس ماڵو داراییە لەلایەن مەسیحیو جوولەکەوە دێت.

*ئەگەر بینی زێڕ دەتوێنێتەوە بەربەرەکانیو کێشمەکێش لەکاروبارەکانی دنیادا دروستدەکات.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر قسەی خراپو نابەجێو درۆ هەڵبەستن.

*ئەگەر شتێکی لەدەستی خۆیدا بینی با وریابێت لەکۆمەڵێك دژایەتیدەکەنو گوێڕایەڵی پەروەردگارەکەی بکات چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ مِن حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُ خُوَارٌ﴾ (الأعراف: ١٤٨).نە زێڕو نەزیو نەبوو بەڵکو مسی زەردبوو.

*ئەگەر زێڕ یاخود مسی بینی درۆو بوختان یاقسەی ناشیرین دەکات.

(نابلسی) دەڵێت: زێڕ پیاوێکە شانازیدەکات بەخۆشییەکانی دنیاو ئەوەی پێی بچوێنرێ داخوازی خۆشییە.

# ژێ



## ژم

**ژماره( نمره )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ژمارە پێچەوانەی ژمێردراو دەبێت، ئەگەر بینی درهەمێك دەژمێرێ کەناوی خودای تێدایە یادوزیکری خوداوەند دەکات، ئەگەر دینارێکی دەژمارد ناوی خودای تێدابوو زانیاری وەردەگرێ.

* ئەگەر نەخشەکەی وێنەو نیگارێکبوو خۆی سەر قاڵدەکات بەشتە پڕوپووچەکانی دنیاوە.

* ئەگەر گەوهەری ژمارد قورئان دەخوێنێ.

* ئەگەر گەنجینەو شتی گرانبەهای ژمارد فێری زانیاریدەبێت یاخود فێری خەڵکیدەکات.

* ئەگەر مورووی بژارد خۆی بەکارێکەوە سەرقاڵدەکات کەهیچ پەیوەندییەکی نییە پێوەی.

* ئەگەر مانگای قەڵەوی بژارد چەندین ساڵ بەسەریا تێپەڕدەبێو پڕ لەفەڕوپیت دەبێ.

* ئەگەر حوشتری بژارد بەبارەوە ئەگەر دەستەڵاتداربوو لەدوژمنەکانیەوە سوود وەردەگرێو بەهای ئەو سوودە بەئەندازەی باری حوشترەکان دەبێ.

* ئەگەر بازرگانبوو سوودێکی زۆردەکات.

* ئەگەر بینی گامێش دەژمێرێ دەکەوێتە ناڕەحەتیو مەینەتی بژێویەوە.

* هەروەها هەموو ژمارەیەك لەپێکهاتەو شتێکدا دەگەڕێتەوە بۆ ناواخنو ڕەچەڵەکی ئەوشتە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی پێنج هەزار دەژمێرێ سەردەکەوێت بەسەر دوژمنەکانیدا هەروەها ژمارەی بیستو سەد سەرکەوتنە.

* ئەگەر بینی حەوت یان هەشت دەژمێرێ دەکەوێتە نێو غەمو پەژارەوە.

* ئەگەر بینی نۆ دەژمێرێ لەکارێکی قورسوگراندایەو هاوەلایەتی کۆمەلێکی خراپەکار دەکات.
* هەروەها دەلێن: ژمارە (دە) بەلگەیە لەسەر (حەج).
* ئەگەر بینی چل دەژمێرێ لەکارێکدایە بەلێنی تیاداوە.
* ئەگەر سی بژارد بەلێنێکی درۆیداوە.
* یەك لەخەودا بەلگەیە لەسەر بەتەنیا شوێن زانستو مالکەوتنو هاوسەرگیری یان بوونی کوڕ.
* دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر تەمبەلیو وەستان لەبەشداری.
* یەك حەقی تاكو تەنیایە.
* دوو سەرکەوتنە بەسەر دوژمناندا.
* سێ بەدەستهێنانی بەلێنو پەیمانە.
* چوار بەلگەیەکی چەسپاوە.
* پێنجو شەش گومانە لەئایندا، دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر سەرکەوتنو بەجێهێنانی بەلگەیە لەسەر نەیارانو ژمارەی حەوتو هەشت هیچ خێرێکی تێدا نییە.
* دە کەفارەتی سوێندە یان بۆ یەکێك ڕێنومایی نەبێ لە(حەج)دا.
* ئەگەر بینی درهەم دەژمێرێو ناوی خودای تێدایە یادو زیکری خەدا دەکات.

## ژن

ژن: (نابلسی)دەلێت: ئەگەر جوانبوو لەخەودا بەلگەیە لەسەر سالی پڕفەڕو خێرو پشوودانوماندودەرکردن.
* دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر:
+گەنجینە.
+سندووق.
+ئەوەی مرۆڤ شتی تێدا هەلدەگرێ.
+زیندان.
+شەریك.
+ئەوەی ئاگاداری نهێنی دەبێت.
+دارودرەختی بەروبوومدار.
+سیر.
* ئەگەر ژنێکی جوانو شۆخو شەنگی بینی هاتە نێومالەکەی خۆشحالیو شادی بەدەستدەهێنێ.
* ژنی شۆخو شەنگ مالو سامانێکە نامێنێتەوە چونکە حالوباری دەگۆڕێ.
* ئەگەر ژنێکی لاووجەحێلی بینی ڕووی تێکرد کاروبارەکانی دوای لەکیسچوون بۆ دەگەڕێتەوە.
* ژنی حەجێلی عەرەبی بالابەرزی گەنم ڕەنگو نادیار باشە لەلێکدانەوەدا.
* ژنی قەلەو فەڕوپیتی سالەو بەپێچەوانەوە.
* ئەگەر ژنێك لەخەودا ژنێکی لاووجەحێلی بینی دوژمنیەتی بەهەر

حاڵێك بێت ، ئەگەر پیرێکی بینی هەوڵو کۆششی بەسەردەچێت.

*ئەگەر ژنێکی شۆخوشەنگی بینیو قسەی لەگەڵداکردو بزەوپێکەنینیانکرد، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت، ئەگەر زیندانیبوو ئازاددەکرێ ، ئەگەر ئەو ژنە داپۆشراوبوو هەواڵێکی پەنهانو نادیارە ، ژنی نادیار باشترە لەژنی ناسراو.

*ئەگەر ژنێکی بینی فەرمان بەخەڵکی دەداتو رێگریان لێدەکات لەبەر خوداوەند کارێکی باشە لەئایندا.

*ئەگەر ژنێکی رەشی بینی هیچ خێرێکی تێدا نییە.

*ئەگەر ژنی زرێپۆشی بینی روودەکاتە شار.

*ئەگەر ژنێکی بینی دەفرۆشرێ رەواندنەوەی دەستەڵاتەکەیەتیو پەرتەوازەبوونی کاروباریەتی پاشان حاڵوباری روو بەچاکە دەچێت.

*ئەگەر ژنەکەی بینی بوە بەپیاو چوستو چالاکییە بۆ ئەو ژنەو دەوڵەمەندییە بۆ خانەوادەو دنیایەکی بەرینو فراوانە.

*ئەگەربینی ژنەکەی یەکێکی دی بۆ هێنا لێی جیادەبێتەوە ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوانیان.

*ئەگەربینی ژنەکەی هەڵیدەگرێ کەمو کوڕی رووی تێدەکات ، هەروەها دەڵێن: دەوڵەمەند دەبێ.

*ئەگەربینی ژنەکەی ئەوەنەبوو کەلەکاتی بێداریدابینی هەندێك لەماڵوسامانی دەڕواتو پاشان دەیدۆزێتەوە، ئەگەربینی کوشتی هەندێك لەماڵەکەی تیادەچێت.

*ئەگەربینی چوە لای سەرجەم ماڵوسامانی تیادەچێت.

*ئەگەربینی ژنەکەی دەنێرێت بۆ لای کەسانیتر یاخود بینی شوویکردوە بەکەسێکیتر ئاینەکەی تیادەچێت بەڵام کۆتا ئەنجامی باشدەبێت.

*ژن دنیاو چێژوو سوودو قازانجە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەستەڵاتدار چونکە بەسەر پیاودا حوکمدەکات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زەویو بێستانو سەرجەم ئامرازی گواستنەوە.

**ژنان**:(نابلسی)دەڵێت: بینیان بەڵگەیە لەسەر جوانی دنیا، ئەگەر بینی ژنان رووی تێدەکەن دنیا رووی تێدەکات، ئەوەی پشتی تێبکات هەژار دەکەوێت.

*ئەگەر بینی لەگەڵ ژناندا دانیشت رازیو دڵنیابوو تەمبەڵی دەنوێنێ بەپێی ئایەتی ﴿ رضوا بأن يكونوا مع

أكخوالف ﴾ ( التوبة: ٨٧) لێرەدا مەبەستی ژنانە.

**ژنانیبوون:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی رەفتاری ژندەکات لەخەودا غەمو پەژارە رووی تێدەگات.

## ژوو

**ژوور:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ژوور بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەبەرزی.

*ژووریش بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی ترساو بەپێی ئایەتی: ﴿وهم في الغرفات آمنون ﴾ (سب: ٣٧).

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر بەهەشت بەپێی ئایەتی: ﴿أولئك يجزون الغرفة بما صبروا ﴾ (الفرقان: ٧٥).

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر دوانگە ، چونکە عەرەب بەو چەشنە ناوزەدیدەکات.

*ئەگەر ژوورێکی لەسەرماڵەکەی دروستکردو بینی هاوسەرەکەی رێگری دەکاتو شیوەنو گریانو دەنگ بەرزکردنەوەدەکات یاخود خۆی پێچاوە لەشتێکەوە ژنێکیتر بەسەر ژنەکەیدا دەهێنێ یان هەواڵەکەی بلاودەبێتەوە.

*ئەگەر ژنەکەی شۆخو شەنگبوو بزەو خەندە لەسەر لێوەکانیبوو ژوورەکە بەرزیو بڵندی دنیایەتی.

*ئەگەر سەرکەوت بۆ ژوورێکی نادیار ئەگەر دڵنیابوو دڵنیادەبێت، ئەگەر نەخۆشبوو دەچێت بەرەو بەهەشت ، وەگەرنا پلەوپایەی بەرزو شادیو خۆشی رووی تێدەکات.

*ئەگەر لەبەرزبوونەوەیدا کۆمەڵێکی لەگەڵدابوو دوای کەوتبوەوە دەبێت بەپێشەوا یان بەرنوێژ یاخود فەرمانڕەوایان.

*ئەگەر رەبەنێك بینی لەژوورێکدایە ژنێکی جوانی شۆخو شەنگ دەهێنێ.

*ئەگەر بینی دوو ژووری هەیە یان سیانو زیاتر دڵنیا دەبێت لەوەی لێیدەترسێ.

*ئەگەر بینی دوو ژووری هەیە یان سیانو زیاتر دڵنیادەبێت لەوەی لێدەترسێ.

*ئەگەر بینی ماڵی سەرەوە کەوت بەسەر ماڵی خوارەوەداو زیانی پێنەگەیاند کەسێکی ئاوارەی دەگەڕێتەوە، ئەگەر تەپو تۆزی لەگەڵدابێ ماڵو دارایی لەگەڵدادەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەژوورێکی نوێدایەو هەژارە دەوڵەمەند دەبێ، ئەگەر دەوڵەمەندبوو ماڵو دارایی تیادەچێت.

*ئەگەر خۆی لەژوورێکی کۆندا بینیەوەو هەژاربوو پتر بێپارە دەبیو ئەگەر دەوڵەمەندبوو زیاتر دەوڵەمەند دەبێت.

*ئەگەر بینی ژوورێك دروستدەكات ژنێك دەهێنێ.

*ئەگەر بینی ژوورێك لەسەر ژوورێکیتر دروستدەكات ژن بەسەر ژنەکەی دەهێنێت.

**ژووری نوستن**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەستبڕین و هەڵخەڵەتاندنی کەسانیتر یاخود بەقسە فریوودان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سك و باشی ناوبانگ یان خراپی و رسوایی.

*ئەگەر ژوورێکی نوستنی بۆ دانرا رانەهاتبوو لەسەری هیواو ئومێدی نێوان خۆی و خوداوەند نوێدەبێتەوە.

*ئەگەر باشبوو بەڵگەیە لەسەر باشی کاروباری بەنهێنی، ئەگەر باشنەبوو بەڵگەیە لەسەر هیواو ئاواتی بەتاڵ و خراپی نهێنی.

## ژه

**ژەهر( ژار )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی ژاری پێداو ئاوساو زوخمی تێزا بەئەندازەی ئەوە ماڵ و دارایی دەستدەکەوێ، ئەگەر کێم و زوخمی نەدی غەم و پەژارەو بەڵاو نەهامەتی تووشدەبێ.

*هەروەها دەڵێن: ژاری بکوژ بەڵگەیە لەسەر مەرگ.

(نابلسی)دەڵێت: ژار بۆ یەکێك بیخواتەوە ئەگەر شوێنەکەی کێم و زوخمی لێنەیەت یان لوویەکی لەجێدەرنەیەت غەم و پەژارەیە.

*ئەگەر بینی ژار دەرخواردی کەسێکدەدات کاری داوێنپیسی بەژنەکەی ئەنجامدەدات چونکە ژار بەنهێنی دەرخواردی خەڵکی دەدرێت، هەروەها داوێنپیسی و زیناش بەنهێنی ئەنجامدەدرێت.

*ئەگەر ببینێت ژار دەخواتەوە تەمەنی درێژدەبێت.

## ژی

**ژیشك**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی دڵتەنگ و بێبەزەییەو زوو توورەدەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر پلانو فێڵو سیخوڕیو خۆشاردنەوەو شەڕو سندووقی چەك.

## ژێ

**ژمێریاری دیوان:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ژمێریاری دیوان پیاوێکە ئەشکەنجەو سزای خەڵکیدەدات لەمامەڵەکردن لەگەڵیانو فشاریان دەخاتەسەر لەکاروبارە ماددیەکاندا.

(نابلسی)دەڵێت: ژمێریاری فەرمانڕەواو پادشا لەسەر چەن پلەوپایەیەکە، ئەگەر کرێکارە ئەرکی خۆی بەجێگەیاند پلەوپایەی بەرزدەبێتەوەو رزقو رۆزی فراواندەبێت.

*ئەگەر مەردوم دیوانو شوێنێکی نادیاری بینیو لێیان دەپرسیەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بیدعەو گومراییەو، لێیدەپرسرێتەوە لەسەرئەوەی لەسەری نووسراوە، دەگونجێت ئەو دیوانەبێت کردارەکانی تیا تۆمار دەکرێت.

*ئەگەربینی بەبزەو خەندەوە بۆنیان خۆشبوو جلوبەرگەکانیان جوانبوو بەڵگەیە لەسەر کرداری باش، خۆئەگەر بەپێچەوانەی ئەوەوە بەدیکردن بەڵگەیە لەسەر کەمتەرخەمی لەکاروبارەکاندا.

**ژێردەرپێ:** بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزی لەسەفەردا، دەگونجێت لەلێکدانەوەدا بەرگدرووبێت.

# سين



## س ا

**سابرێن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سابرێن پیاوێکی بەهەیبەتە لەشێوەدا بەڵام گێلو کەودەنە لەهەڵبژاردندا. دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەندەی رەش پێستو نەزان لەلێکدانەوەشدا نزیکە لەبەرانەوە.

(نابلسی)دەڵێت: سابرێت پیاوێکی لەشولار گەورەیە، لەئاینەکەیدا مەزنو ناودارە.

**سابوون:** (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی ببینێ لەخەودا دەستی بەسابوون دەشوات نائومێد دەبێت لەداوای خۆیو وتراویشە : هیچی تێدا نییەو باشە.

*هەروەها دەڵێن: مەگەر لەماددەیەکی تر یان بۆگەنبێت ئەوکات بەڵگەیە لەسەر رەوانەوەی غەمو پەژارەو ناخۆشیو بەدەستهێنانی پێداویستی ، هەروەها دەڵێن: دەستشتن بەسابوون بەڵگەیە لەسەر دواییهێنان بەپەیوەندی هاوەڵایەتی یان دوایی هێنان بەبەربەرەکانیو ناکۆکی.

*وتراویشە: قوتاربوونە لەترسو بیمو تەوبەیە لەگوناهەکان.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵێکە بەدەستدێتو پارچە سابوون پیاوێکە غەمو پەژارە لەبیر دەباتەوە.

*ئەگەر بەسابوون جلێکی شتو لەچڵكو پیسی پاکیکردەوە چاکدەبێتەوە یان تەوبەدەکاتو غەمو پەژارەی دەرەوێتەوەو قەرزەکانی دەداتەوە.

*دەگونجێت پارچە سابوونێك چیرۆکێك بێت بینوسێتو لەلای دەستەڵاتدار بیخاتە روو.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رەوانەوەی غەمو پەژارە چونکە پیسیو چڵك لادەباتو پیسیو چڵکیش غەمو پەژارەیە.

**سابوونچی:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر قورئانو یادی خواو ئەوەی گوناه دەسڕێتەوە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ڕەواندنەوەی غەمو پەژارەو دڵتەنگیو قەرزدانەوە.

* سابوونچی پیاوێکی بوختانچییە، ئەوەی سابوونچییەك ببینێ ئەگەر لەماڵدابێت لەوماڵەدا کەسێك دەمرێ.

**سارێژکردن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سارێژکاری زامو برین بانگخوازی خەڵکییە بۆ خۆشەویستیو دۆستایەتی.

**ساز:** سازو هاوچەشنەکانی لەئامرازەکانی گۆرانی شتی پڕوپووچو قسەی بەتاڵە.

* دەگونجێت بۆیەکێك کەلەخەودابێ بیژەنیو بەدین نەبێت قسەوپیاهەڵدانی خراپ بێتو ئەوکەسە درۆزن بێت.

(نابلسی)دەڵێت: ساز لەخەودا گاڵتەوگەپو قسەی پڕوپووچو دنیایە، یان قسەیەکی درۆیەو لێدەرو گوێگری وەك یەك وایە.

* هەروەها دەڵێن: ئەگەر هەڵیکوڵی بەڵگەیە لەسەر دەستەڵات یان ڕێزدارێك نیگەرانبووە لەشکۆمەندیو حاڵوباری خۆیدا.

* بۆکەسێك کەمو کوڕیو کاری داپۆشراوو پەنهانی هەبێت ئامۆژگاریو پەندە، بۆ کەسی بەدخووش تێکدانی خەڵکییە، بۆ ستەمکار هۆکارێکە بەهۆیەوە ستمدەکات لەگەڵ کۆمەڵێكو ڕیخۆڵەکانیان دەبڕێت.

* ئەوەی ببینێ لەماڵەکەی خۆیدا سازلێدەدات نەهامەتیو بەلا ڕووی تێدەکات.

* ژەنەری ساز سەرکردەی ناحەقو مەترسیدارن.

* ئەوەی ببینێ ساز لێدەدات یان هەر ئامێرێك جۆرێك لەخەمو پەژارە ڕووی تێدەکات.

* ساز بەڵگەیە لەسەر حەزو ئارەزووی خەڵکیو کاروباری پڕوپووچ.

* ئەگەر لەگەڵ سازدا تەپڵو سەمای لەگەڵبوو بەلاو نەهامەتی ڕوو دەکاتە خەڵکی ئەو شوێنە.

**سافو لووسبوونی لەشولار:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر مووی پێستی لابرد بەڵگەی خۆشیو شادییە، بەلام ئەگەر لاینەبرد بەڵگەی کەوتنە بەسەر ئاینو زیادبوونی غەمو پەژارەیە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لاینەبات غەمو پەژارەیە زۆر نامێنێتەوە، ئەگەر هەموو

لەش‌ولاری گرتەوە بەدەر لەدەم‌وچاوی دەمرێت.

*ئەگەر جەستەی ساف‌و لووس‌بوو لەکاتی بەئاگایدا موو بەلەش‌و لارییەوە نەبوو هەموو لەش‌و لاری لەخەوەکەیدا سافکرد بەدەر لەپێشی دەمرێت‌و ماڵ‌و داراییەکەی بەسەردەچێت‌و بەتەنیا ژنەکانی دەمێننەوە.

**سافیر**[1]: (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سەرسامی‌و خۆشاردنەوەو ملکەچکردن بۆ تواناداری ترسان لەدوژمن.

**سال**: (نابلسی) دەڵێت: بۆ ژنی دووگیان بەڵگەیە لەسەر قوتاربوون لەمناڵبوون.

هەروەها دەڵێت: بینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر فیتنە بۆ خەوبینەر کەڕوودەکاتە خۆی‌و کەسانیتر بەپێی ئایەتی: ﴿أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ (التوبة: ١٢٦).

*ئەگەر خەڵکی لەنەبوونیدا بوون بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی خێر.

**سالح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت)**: (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی لەخەودا ببینێ لەکۆمەڵێك نەزانەوە غەم‌و پەژارەی پێدەگات، پاشان لەکۆتاییدا زاڵدەبێت لەگەڵیانداو دوای جیاوازی جیادەبێتەوە لەگەڵیان.

*ئەگەر (ساڵح)ی بینی (سەلامی خوای لێبێت) لەکاروبارو وتەدا چاك‌و باشدەبێ، هەروەها دەڵێن: دوژمنەکانی هەڵدەدەکەن بەرانبەری‌و زاڵدەبن بەسەریاو پاشان لەکۆتاییدا ئەو زاڵدەبێ بەسەریاندا.

**ساوەر**: (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رزق‌و رۆزییەکی بەردەست‌و دەرخستنی حەق‌و پشوودان دوای هیلاکی‌و ماندووبوون.

*هەروەها لەخەودا رزق‌و رۆزییە بەڵام ساوەری برنج نیعمەتە، ئاردی سپیش هاوسەرە بۆ کەسێکی رەبەنی بەتوانا.

*دەگونجێت ساوەر بەڵگەبێت لەسەر:

+زانیارییەکی باش‌و سەفەر.

+ماڵ‌و دارایی.

+فرۆشگاو توێشوو.

+قەڵایەکی پتەو قایم.

+چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

*ساوەر بەدەر لەگەنم چاکبوونەوەیە لەنەخۆشی خواردنیشی هەژاری‌و نەدارییە.

---

[1] **سافیر**: باڵندەیەکە شەواندەخوێنێ لەترسی ئەوەی راونەکرێ. (وەرگێڕ).

*ساوەری گەنم ماڵو داراییەکی کۆکراوەیە لەگەڵ ماڵو منداڵو شێلانی سەفەرە بۆلای خزمەکانی.

*ئەگەر بینی هەویرەکەی دەشێلێ پیاوێکی باوەڕدار دەبێتو دەستەڵاتو فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێتو دەستەڵاتو زەفەر دەبات.

**س پ**

**سپڵ**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: هێزی سپڵ دەروەو توانای لەشولارە، بەڵام ئێشو ئازاری سپڵ بەڵگەیە لەسەر تێکدانی ماڵێکی گەورەو بێشومار بژێوی خۆیو خانەوادەکەی پێوەیەو بردنی روو بەتیاچوونو فەوتانە، ئەگەر ئێشو ئازارەکەی زیادیکرد هەتا ترسیان لێنیشت بمرێ بەڵگەیە لەسەر بەسەرچوونی ئاینی.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا سپڵی بەبەهێزی بینی ماڵو گەنجی خاوەنەکەی پتەودەبێتو خۆشیو شادی پێبەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی سپڵی گەورەیە بەڵگەیە لەسەر گەندەڵبوونی ویستو خوازیو گۆڕانی حاڵو باری یاخود نەخۆشیەکی خراپ زاڵدەبێ بەسەریا.

**سپەند( پیچن )**[1]: (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەموو گورزەیەکی سەد دینار یا سەد درهەمە بەپێی ئاستی خەوبینەر.

**سپیکار**: (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر سپیکاری خوریبوو بەڵگەیە لەسەر کارە کورتەکان ، سپیکاری دیوار بەڵگەیە لەسەر دروومان، هەروەها بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندیو پلەوپایەو بەرزیو پیاهەڵدانو بەجێهێنانی کاروبار.

*سپیکەرەوەی مس بینینی بەڵگەیە لەسەر خاوەن کرداری چاك لەنهێنیو ئاشکرادا.

**س ت**

**ستایش**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خێرێکی زیادە، ئەوەی ببینێ ستایشی پەروەردگار دەکات نورو روناکیو رێنومایی لەئایندا بەدەستدەکەوێت.

*هەروەها دەڵێت:ئەوەی ببینێ سوپاسو ستایشی پەروەردگار دەکات کوڕێکی پێدەبەخشرێ، ستایش لەخەودا دەوڵەمەندییە بۆ هەژار.

---

[1] **سپەند**: رووەکێکی بۆنخۆشە. (وەرگێڕ).

* ئەگەر بینی ستایشی خودا دەکات پیاوێکی سوپاسگوزارە نیعمەتو بەخششی زۆری پێدەبەخشرێ لەگەڵ دووکوڕی زانا، پەروەردگار دەفەرموێ:﴿لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَنْ شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ﴾ (النمل:٤)هەروەها دەفەرموێت: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَرِ إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ﴾(ابراهيم:٣٩).

**ستایشی خود( بەخۆداهەڵدان )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەشانو باڵی خۆدا هەڵدانی مرۆڤ بەڵگەیە لەسەر گوناهو تاوان ئەنجامدان بەپێی ئایەتی: ﴿فَلَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى﴾ (النجم).

* ئەگەر بینی لاوێکی نادیار بەشانو باڵیدا هەڵدەدات لەلایەن خەڵکیەوە بەباشە باسدەکرێت، ئەگەر پیرو لاوەکە ناسراوبوون بەهۆیانەوە پلەوپایەو مەزنی دەستدەکەوێت.

**ستوون( کۆڵەکە ـ پایە )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ستوون بەڵگەیە لەسەرئەوەی پشتی پێدەبەستیو کۆڵەکەو چەقو پاڵپشتە وەك ئیسلامو قورئانو سوننەتو شارەزایی لەئاینو دەستەلاتدارو زاناو باوكو گەورەو هاوسەرو گەواهیدەرو ماڵو سامان وایە.

* هەروەها بەلێکدانەوەی رووداوێكو راستی خەون دادەنرێ.

* ئەگەر کۆڵەکەو ستوونێکی بینی لاربووەوەو خەریکبوو دەکەوت، ئەگەر لەمزگەوتێکی گەورەدابوو پیاوێکی دەستەلاتدار دووڕوویی دەنوێنێو دەیەوێت دەربچێت لەفەرمانڕەوایی یان لەرێبازو مەزهەبەکەی یان زانایەکە یاخود پیاوچاکێك ستەمدەکات لەکارەکەیداو لەرێگەی راست لادەدات بەهۆی فیتنەو ئاشووبێك رووی تێدەکات یان بەلاو نەهامەتیەك. ئەگەر لەمزگەوتی گوند یا هۆزو تیرەکەیدابوو ئیمامەتو بانگبێژییە یاخود ئەوەی خزمەتیدەکات.

* ئەگەر کۆڵەکەی ماڵەکەی خۆیبوو ئەگەر خەوبینەر خزمەتکارییبوو کۆڵەکە گەورە بەرپرسەو دەگۆڕێت برانبەریو کارێکی قێزەوندەکات لەبەرانبەریدا.

* ئەگەر ژنبوو کۆڵەکەکە مێردەکەیەتی.

* ئەگەر پیاوبوو کۆڵەکەکە باوکیەتیو کەوتنی ئەو کۆڵەکەیە دەدرێتە پاڵی یاخود دەمرێت ئەگەر نەخۆشبوو، هەروەها ئەگەر هەڵچوو بەئاسمانداو

ونبوو یان کەوتەنێو بیروچاڵێکو نەبینرا.
*ئەگەر کۆڵەکەکە هی کەنیسەبوو دەخرێتە پاڵ قەشە یان بیدعەکارێکە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی لەئاسمانەوە کۆڵەکەیەك دابەزی خوداوەند دەستەڵاتێکی نەرمونیانی پێدەبەخشێ.
*ئەگەر بینی بەکۆڵەکە لێدرا وتەو قسەیە ئەگەر برینداریکرد زیانی پێدەگەیەنێ.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی بەکۆڵەکە لێدرا ئەگەر ئازادبوو ترسی کوتوپێوانکردنی ئازادی رووی تێدەکات.
*کۆڵەکەو ستوون بەڵگەیە لەسەر ئەو پیاوانەی پشتیان پێدەبەستێ لەکاروباری قورس وگراندا.
*ئەگەر بینی بوە بەخاوەنی کۆڵەکەو ستوون یان خۆی بەستوونو کۆڵەکە بینی ئەگەر زانابوو زانستخوازو ئاینداز لەدەوری کۆدەبنەوە.
*کۆڵەکە باوکە یان کوڕو ماڵودارایی یاخود هاوکارە یان ئاژەڵو هاوسەرە یان پادشایە.
*ئەگەر بینی بوە بەکۆڵەکە دەمرێو هەڵدەگیرێ روو بەگۆڕستان.

*کۆڵە فرمێسکە یا ماڵێکی زۆرە یان پیاو یاخود ژنێکی بەرێزو ئابڕوداره،
ئەگەر لەبەردێکی سەختبوو دەگونجێت رێزدارو بەئابرونەبێ، ئەگەر لەبەردێکی ئاساییوو بەخێرایی دەگۆڕێ، بەڵام ئەگەر لەداربوو دووڕوودەبێت.
*ئەگەر کۆڵەکەو ستوونێکی گشتیبوو لەجێی خۆی لاربووەوە پیاوێکە لەپیاوەکانی دەستەڵاتدارو لەفەرمانبەردایی دەردەچێت.
*ئەگەر کۆڵەکەی مزگەوتبوو ئیمامەت یا بانگدان ئەنجامدەدات.

## س ر

**سرکە( ترشیات )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: سرکە ماڵێکی پیرۆزە بۆ خواناسان کەمێکی ئارەزووبازیو تەمەندرێژییە ئەگەر بەنانەوە بیخوات.
*زەیتیش ماڵێکی سووکو کەم سوودو بەلاداره.
*کووپەو دەبەو دەفری ترشیاتو سرکە کیژێکی بەسۆزو بەزەییە.
*ئەگەر مرۆڤێك ببینێ ترشیات دەخواتەوە دژایەتی خانەوادەکەی دەکات بەهۆی ئەو گرژبوونەی دێت بەسەر دەمو زاردا.
*سرکە ماڵێکی حەلاڵو دروستە لەنەخۆشیداو نەخۆش زۆر لەسەر جێگە

دەمێنێتەوەو لەسەر وەسیەت دەمرێت تێیدا.

(نابلسی)دەڵێت: خواردنەوەی ترشیات بۆ زیندانی بەڵگەیە لەسەر ئازادی‌و قوتاربوون.

* ئەو سرکەیەی ئەسڵبێت بەڵگەیە لەسەر خۆ ماندوکردن لەگەڕان بەدووی هۆکاردا، لەگەڵ ماندوبوون‌و ڕەنج‌و هەوڵی قورس‌وگران.

* دەگونجێت سرکە بەڵگەبێت لەسەر:

+کەم‌و کوڕی لەژن‌و کوڕدا یاخود کاروپیشەدا.

+دڵنیابوون دوای ترس‌و بیم.

+بەرپەرچدانەوەی خراپەو دوژمنان.

+بەندایەتی‌و ئارامگرتن لەسەر ئەرك‌و قورساییەکەی.

+هاوڕێ‌و دۆست.

**سرکە دروستکەر:** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیاوێك ماڵ‌و سامانی خانەوادەکەی بخوات‌و کەل‌و کەمیبکات.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

+پابەندبوون بەسوننەتی پێغەمبەرەوە(ﷺ).

+کەسێك بەڵێن بشکێنێ‌و بەسەری نەبات.

**سرکەفرۆش:** لەلێکدانەوەدا باش نییە چونکە دەستەواژەی (خلل - ناتەواوی) لەخۆگرتوە.

* هەروەها دەڵێن: خراپ نییە چونکە پیسی‌و چڵکی ددانەکان پاکدەکاتەوە، لەلێکدانەوەشدا خانەوادەی ماڵێکە.

* بەڵگەیە لەسەر:

+ڕزق‌و ڕۆزی‌و پاکیتی.

+تەوبەو داوای لێخۆشبوون.

+کرێگرتە.

+کوڕی بەسوودو قازانج.

## س ڕ

**سڕبوون:** ئەگەر لەخەودا بینی دەستی سڕبوە یاخود هەندێك لەلاشەی سڕبوە ئەو ئەندامەی تووشی ملکەچیدەکات‌و لەو ئاستەیا نابێت کەچاوەڕێی بوە.

## س ز

**سزا( تۆڵە ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا تەمەنێکی درێژە بەپێی ئایەتی: ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ﴾ (البقرة:١٧٩).

* تۆڵەو سزا بەڵگەیە لەسەرنەوەی لەسەریەتی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زۆرلێکردن لەوگوناهانەی مرۆڤ ئەنجامیدەدات وەك بەزۆر نوێژکردن‌و ڕۆژووگرتن‌و زەکاتدان.

## س ف

**سفره( خوان ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: یەکێك لەخەودا بینی دەنگێکهاتو گوێبیستبوو ئەم ئایەتی دەخوێندەوە: ﴿اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِّنَ السَّمَاءِ﴾(المائدة:١١٤) خەونەکەی بۆ راڤەکارێکی خەو گێڕایەوە ئەویش وتی: تۆ لەنارەحەتیدایتو داوا لەخوداوەند دەکەیت دەرووی خێرت لێبکاتەوەو وەڵام دەدرێیتەوە، بەوچەشنەبوو کەبۆی لێکدایەوە.

*راڤەکارانی خەو لەلێکدانەوەیان بۆ سفرە جیاوازی هەیە لەنێوانیاندا هەندێکدەڵێن: سفرە پیاوێکی رێزداری دڵفراوانەو دانیشتن لەسەری هاوەڵایەتیەتیو خواردن لێی سوود وەرگرتنە لێی ، ئەگەر لەسەر ئەو سفرەیە چەند پیاوێکی لەگەڵدابوو برایەتی لەگەڵ کۆمەڵێکدا دەکات لەسەر خۆشیو پاشان شەڕو ئاژاوە لەسەر بژێوی دەکەوێتەوە لەنێوانیاندا.

*خواردنی خۆشوپاك لەسەر سفرە بەڵگەیە لەسەر تەبایيو خۆشەویستیانو هەندێکدەڵێن: سفرە قەرزە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ)و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا لەخەودا پاوانێکی سەوزم بینی سفرەیەکی لەسەر راخرابوو لەگەڵ دوانگەیەکدا حەوت نمرەی هەبوو، تۆم بینی لەپلەی حەوتەمداو خەڵکیت بانگدەکرد بۆ سەر سفرەکە ، ئەویش( ﷺ)فەرمووی: "سفرەکە ئیسلامە ، پاوانە سەوزەکە بەهەشتەو دوانگە حەوت پلەییەکەش مانەوەی دنیایە بەحەوت هەزار ساڵو شەش هەزاری رۆیوەو لەحەوتەمداین بانگەوازەکەش بانگەوازی خەڵکییە بۆ لای ئیسلامو بەهەشت"[1].

*هەندێکیتر دەڵێن: هاوسەرو ژنی پیاوە.

*دەگێڕنەوە یەکێك بینیویەتی لەسەر سفرەیەك ناندەخوات هەرکات دەستی بردوە بۆ سفرەکە دەستی سەگێکی زەرد لەژێر سفرەکەوە هاتوەتە دەرەوە لەگەڵیدا خواردوویەتی، ئنجا خەوەکەی بۆ راڤەکارێکی خەو دەگێڕێتەوە، ئەویش دەڵێ: ئەگەر خەونەکەت بەو چەشنەبێ لاوێك دەستی تێکەڵکردوە لەگەڵ ژنەکەتدا، کاتێ گەڕاو بەدوویداچوو قسەی راڤەکارەکە راستدەرچوو.

---

[1] سەرچاوەی ئەم باسە لە دەقە عەرەبییەکەیدا دیارینەکراوە. (وەرگێڕ).

*ئەگەر نانی بینی لەسەر سفرەوخوان، سفرەکەدانرابوو دوژمنی بۆپەیدادەبێ ، ئەگەرینی لێیدەخوات ناکۆکی لەنێوان خۆی‌و دوژمنەکەدا دەردەکەوێ لەسەر راوبۆچوونی هەندێك لەراڤەکارانی خەو.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر خواردنێکی زۆری لەسەرسفرەخوارد بەدەر لەسروشتی خۆی بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی بەئەندازەی خواردنەکەی.

*ئەگەر بینی ئەو سفرەیە بەرزکرایەوە تەمەنی بەسەرچوەو دواییەتی.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر جۆرێك یان دوو جۆر خواردنی لەسەر سفرەکە بینی رزقێکە پێیدەگات بەخۆی‌و منداڵەکانی بەپێی ئایەتی: ﴿أَنزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ﴾.

*هەروەها وتراوە: سفرە دەستکەوتێکە لەمەترسیدایەو بەرزکردنەوەو لابردنی تەواوبوونی ئەو دەستکەوتەیە.

*هەروەها دەڵێن: شوێنی نانخواردن‌و بژێوییە بۆ یەکێك لێیبخوات، ئەگەر هەر خۆی بەتەنیا لەسەریبوو نەیارو بەربەرەکانی نابێت، ئەگەر کەسێکیتر لەسەر بینی برای هاوبەشن لەگەڵیدا.

*زۆری نان خۆشەویستی‌و ئەوینەو کەمیشی بەپێچەوانەوەیە.

*نان خۆشەویستی ساڵێکە، ئەگەربینی خواردن رادەخات سووکایەتیکردنە بەنازونیعمەتەکانی خودا.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا نازو نیعمەت‌و وەلامدانەوەو بانگەوازو ژینێکی خۆشنوودو سەرکەوتنە بەسەر دوژمناندا.

*زۆری خواردن لەسەر سفرە بەڵگەیە لەسەر زۆری منداڵ، ئەگەر دووشتی دژ بەیەك لەسەر سفرە کۆبوونەوە بەڵگەیە لەسەر جەنگ بەتایبەت ئەگەر خواردنەکەی سەری سوورەوکراوو هەریسەبوو، خوان‌و سفرە مەیدان‌و گۆرەپانی بەربەرەکانییە.

**س ك**

**سك ( ورگ )**: (ئیبن سیرین) دەڵێن: سك لەناوەوەو دەرەوە ماڵ‌و دارایی پیاوو منداڵ‌و خزم‌و کەس‌و لانەی خانەوادەیەتی.

*ئەگەر بینی برسیەتی سووردەبێت لەسەری‌و ماڵێك بەئەندازەی برسێتی بەدەستدەهێنێت.

*هەروەها دەڵێت: هەلاوسان‌و گەورەیی سك لەخواردنی سووەوە هاتوە، رۆیشتن بەسەر سکدا پشتبەستنە بەماڵ‌و دارایی ، ئەگەر

بینی ورگی بچووك بوه شتومەكی زۆر دەبێت.

*ئەوەی ببینێ سكی گەورەبووە ماڵو سامانەكەی لەسەرپێچی خودایا خەرجدەكاتو خۆشی پەشیمان دەبێتەوە لێیو دەیەوێت تەوبەبكات.

(نابلسی) دەڵێت: سك لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەیگرێتەخۆ لەخانەوادەو ماڵو نهێنیو ئەوەی لێی دەردەچێتو بەڵگەیە لەسەر زیندانو گۆڕو نهێنیو لەشساغیو نەخۆشو هاوڕێو ئەسپەردەكاری ئاینو بەندایەتی، ئەوەی لەخەودا سكی بتەقێنرێو دەستەلاتداربێت سوودو قازانجی نابێت مەگەر لەو ماڵەی بۆ خانەوادەكەی داناوە، دەگونجێت نهێنیو پەنهانی ئاشكرابێت یا ژنەكەی لەدەستبدات.

*ئەگەر ژنەكەی دووگیانبوو منالەكەی لەسكیەوە دێتە دەرەوە، ئەگەر شتێك لەریخۆڵەكانیەوە هاتە دەرووە یان لە ئەندامەكانیەوە خراپەو بەدرەفتاری بەدەردەكەوێت، وەگەرنا مردن یان زامێكەو دوومەڵی ناوسكی دەردەكەوێت.

*ئەگەر ئێشو ئازاری سكی هەبوو ئازارو ژانەكەی دەڕەوێتەوە.

*ئەگەر ورگی لەدەستدا هاوڕێكەی دەمرێت یاخود بەرپرسەكەی یان دادوەری ماڵەكەی، دەگونجێت واز لەخواردنو خواردنەوە بهێنێتو رووبكاتە زوهدو خواناسی.

*ئەگەر ئاگر لەسكی هاتە دەرەوە بەڵگەیە لەسەر تەوبەكردنی لەخواردنی ماڵی هەتیوان.

*ئەگەر لەوانەبوو لەقاپو قاجاغی حەرامدا نانیان دەخوار بەڵگەیە لەسەر خۆگرتنەوەو زوهدی.

*ئەگەر لەسەر سكی چوو بەڕێوە بەڵگەیە لەسەر هەژاریو نەدارییو گەڕانی بەسەر خەڵكیدا بۆ تێركردنی ورگی.

*سك نێوجەرگەری دۆڵو شیوە دەگونجێت سك لەلێكدانەوەدا بەڵگەبێت لەسەر:

+هۆزو تیرە.

+ورگو چوونە ئەستۆی سەفەر یان زیندانی یا گەڕانەوەی ئاوارەو غەریب بێت.

*ئەگەر لەنێو سكیدا كێمو زوخمو برینی دی بەڵگەیە لەسەر خواردنی سەرجێی حەرام.

*ئەگەر سكی باشبوو یان گەورەبوو بەچەشنێك سوودی نەبوو بۆلاشەی بەڵگەیە لەسەر زانیاریو سەركردایەتی.

*دەگونجێت سك بەڵگەبێت لەسەر پەنهانیکردن لەئاین و شاردنەوەی رق و قین.

*ئەوەی بینی سکی بەتاڵەو سروشتی هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتوه لەماڵ و وەچەکەی کەمدەکات.

*هەروەها دەڵێن: سکی لەحەرام بەتاڵە، دەگونجێت سك کەشتیی مەردوم بێت هەردەردەدارێك روودەدات روو لەکەشتیەکەی بکات.

*ئەوەی خۆی لەسکی دایکیدا ببینێ ئەگەر لەولاتی خۆیدا نەبوو دەگەڕێتەوە بۆ ولاتی خۆی ، ئەگەر نەخۆشبوو ئەسپەردەی خاك دەکرێت ، ئەگەر لەش ساغبوو زیندانی دەکرێت.

*سك بەڵگەیە لەسەر ماڵی مرۆڤ و ئاژەڵەکانی، جەرگ و دڵ: کوڕەکەیەتی و سیەکانی خزمەتکارو ماڵە، ورگ و سکی کیسەیەو گەرووشی: ژیانێتی.

*ئەوەی ببینێ کیژەکەی یان ماڵەکەی رووخاوەو خۆشی نەخۆشە بەنەخۆشی سکئێشە دەمرێت ، ئەگەر دەستیکرد بەدروستکردنەوەی یان چاککردنی چاکدەبێتەوە لەو نەخۆشیە، وەگەرنا رۆژانی تەمەنی بەئەندازەی مانەوەی ساختمانەکەیەتی.

*ئەگەر سکی مرۆڤ کەشتی بێت سەرەکەی دڵیەتی و گەرووی چارۆکەکەیەتی و پەراسوکانی دیوارەکانیەتی.

*ئەوەی ببینێ سکی لەت لەت و پارچە پارچە بوەو ریخۆڵەکانی هاتوونەتە دەرەوەو پەراسووەکانی شکاون کەشتیەکەی دەشکێ بەڵگەیە بۆیەکێ کەشتێ نەبێت لەسەر فرۆشگاکەی کەخێرو خەرجی لێدەردەچێت.

**سکچوون:** (نابلسی) دەڵێت: سکچوونی ئاسایی لەخەودا زیادەڕەوییە لەماڵ و سامان خەرجکردندا، قەبزیش رەزیلی و دەست نوقاوییە.

**سکەلێدەری دینارو درهەم:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سکەلێدەری دینارو درهەم کەسێکە غەیبەتدەکات و دوو زوبانە، هەروەها دەڵێن: سکەلێدەر پیاوێکی چاکەکاری قسەو گوفت خۆشە ئەگەر ئەجرو پاداشتی لەسەر وەرنەگرێ. هەروەها دەڵێن: پیاوێکە قسەگەرمدەکات.

*ئەگەر بینی سکەی دینارو درهەم لێدەدات لەبەر دەرگای ئیمام ئەگەر شایستەی دەستەلاتبوو وەریدەگرێ.

*هەروەها دەڵێن: سکەلێدەری دینار پارێزگاریدەکات لەنوێژو ئەمانەت ئەسپەردە دەکات.

*لێدانی سکەی درهەمی خراپو قەڵب قسەیەکی خراپو وتەی بێکردارە.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی بەلگەیە لەسەر جێگرو بەڕێوەبەری کاروبارەکانی فەرمانڕەوا یاخود وتاربێژێکی بەناوبانگ.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر:

+نیگارکێش.

+سرەرەوە.

+ئەوەی ماڵو دارایی بەتوندوتیژی بەدەستدەهێنێ.

+ئەوەی سزای تەمێکردن دەسەپێنێ.

## س ل

**سلاوکردن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی تەوقە لەگەڵ دوژمندا دەکات یا باوەشی پێدا دەکات ناخۆشیو دوژمنایەتی لەنێویاندا هەڵدەگیرسێو لەبری خۆشەویستیو تەبایی جێگیردەبێت چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "تەوقەکردن خۆشەویستی زیاددەکات"[1].

*ئەگەر بینی دوژمنەکەی سلاوی لێکرد داوای ئاشتەوایيو ڕێکەوتنی لێدەکات.

*ئەگەر بینی یەکێك سلاوی لێکرد هیچ دژایەتیو ناکۆکییەك نییە لەنێوانیاندا سلاوکار خۆشیوشادی لەسلاولێکەر دەستدەکەوێ، ئەگەر ناکۆکیو ئاژاوە هەبوو لەنێوانیان زاڵدەبێت بەسەریاو لەشەڕو خراپەی دڵنیادەبێت.

*ئەگەر بینی سلاویکرد لەپیاوێکی بەتەمەن نەدەیدەناسی دڵنیاییە لەخەشمو سزای خوایی.

*ئەگەر سلاوویکرد لەپیاوێکی پیر دەیناسی ژنێکی شۆخو شەنگ مارە دەبڕێو چەندین جۆر میوە بەدەستدەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿لَهُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ، سَلَامٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾ (یس:٥٧-٥٨).

*ئەگەر لاوێك سلاوی لێکرد بەلام نەدەیناسی دڵنیادەبێت لەشەڕوخراپەی دوژمنانی.

*ئەگەر پیاوێك بینی سلاو لەپیاوێکدەکاتو وەلامیدەداتەوە کیژەکەی دەداتێ، ئەگەر وەلامی نەدایەوە کیژی ناداتێ.

---

[1](هندی) لە(کنز العمال)دا (١٣٤/٩) ژمارە (٢٥٣٦٥) هێناویەتی بەدەستەواژەی: "ئەوەی بیکات بەبراکەی لەخۆشەویستییەوە تەوقەی لەگەڵبکاتو جیانابنەوە خوداوەندلێیان خۆشدەبێ" دەیگێڕنەوە بۆ (ئیبن شاهین)و ئەویش لە(بزار)ەوە.

*هەروەها ئەگەر لەنێوان خۆیو ئەو پیاوەدا بازرگانی هەبوو لەخەودا بینی سڵاوی لێدەکاتو ئەویش وەڵامی دەداتەوە ئەو بازرگانیەی نێوانیان سەقامگیر دەبێت ئەگەر وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە جێگیرو چەسپاو نابێت.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی سڵاو دەکات لەکەسێكو هیچ دژایەتیو دوژمنایەتییەك نییە لەنێوانیانداو سڵاولێکراو لەسڵاوکارەوە خۆشیو شادی بەدەستدەهێنێت یان خێرو چاکەو دڵنیایی لەشەڕو خراپە بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر دەنگێکی نادیاری بیست سڵاوی لێکرد ئەویش پەسەندیکرد موسوڵماندەبێتو سڵاو دووپاتدەکاتەوەو پاداشتدەدرێتەوە لەسەری، ئەگەر وەڵامیدانەدایەوە پەسەند نەبوو لای پاشان پاداشت نەدرایەوە لەسەری.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی سڵاو لەپیاوێکدەکات غەمو پەژارە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی تەوقەدەکات لەگەڵ یەکێکدا راهاتوە تەوقەبکات لەگەڵیو سڵاوی لێبکات خێروچاکەیەو بەڵگەیە لەسەر وتەیەکی باش گوێبیستی دەبێت وەك ئەو دەدوێت.

*ئەگەر بینی تەوقەدەکاتو دوژمن لەئامێزدەگرێ بەڵگەیە لەسەرئەوەی دوژمنایەتیەکەی پووچو بەتاڵدەبێتەوە.

*ئەگەر بینی فریشتەکان(سڵاویان لەسەر بێت) سڵاوی لێدەکەن خوداوەند بەرپێی رۆشندەکاتەوەو دوایین چارەنووسی بەباشدەبێت.

*سڵاوکردن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گوێڕایەڵی بۆ موسوڵمان.

*دەگونجێت سڵاوکردن بەڵگەبێت لەسەر پێداویستی بۆ یەکێك راهاتبێت لەسەر وەڵامدانەوەی سڵاو ، ئەگەر یەکێك وەڵامیدایەوە سوودمەنددەبێت لەبازرگانیدا، وەگەرنا کاڵاو شتومەکی بازاڕساردی رووی تێدەکات، یاخود وتەکانی لەنێو خەڵکیدا نابیسترێ ، ئەگەر داوایەکی هەبوو بەلام سڵاوی لەکەسنەکرد داواو پێداویستیەکەی بەجێنایەت.

*ئەگەر لەگەڵ نەتەوەیەکدا بەر لەسڵاو دەستیکرد بە لێدوانو قسە بەڵگەیە لەسەر پێچەوانەبوونی سوننەتو رووکردنە بیدعە، هەروەها ئەگەر یەکێك سڵاوی لێکرد بەلام وەڵامینەدایەوە

یـاخود بـە ئاماژەیـەك وەلامیدایـەوە دەگونجێـت سـلاو بەلگـەبێت لەسـەر خۆدان بەدەستەوە.

**س ل**

**سلق:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەلگەیە لەسـەر خێر هـەروەها ملوخیـاش بـەو چەشنەیە.

(نابلـسی) دەڵێـت: ئەگـەر سـلق بـەر لەپێگەیـشتنی خـورا بەلگەیـە لەسـەر ئاین‌و گومانـداری یـاخود پـشتهەلکردن یان بەلگەیە لەسەر ئەو ژنانەی لـەخولی مانگانەدان.

*سـلق وتەیەکـە سـەبارەت بـەئابڕووو دەکرێ.

**س م**

**سم( پاقوولاخ ):** (نابلسی)دەڵێت: سـم بەلگەیە لەسەر زانیـاری‌و شـوێنکەوتنی شوێنەوارو رزق‌و دەولەمەندی بەتایبەت ئەگـەر لەخـەودا جێپێـی فریـشەو پێغەمبەری بەدیکرد.

*سـم بەلگەیـە لەسـەر گواسـتنەوە لەشـوێن‌و جێگەیەکـەوە بـۆ شـوێن‌و جێگەیـەکیتر حـەق تێیـدا فـەرزکراوە، هـەروەها رێنمونییـە بـۆ سـەرگەردان‌و وێڵ.

*ئەگەر گوێی لەدەنگی سمی ولاخ بێت بەبێئەوەی بەدییکات باران‌و لافاوە.

**سمارتـــە( سافولووســـکەر ):** (ئـیبن سیرین)دەڵێت: بەلگەیە لەسـەر ئـەوەی منـــدالێ خـــاوەن دەســـەلاتەو ئەگـــەر رووپایەکی بەردی ساف‌و لووسی بینـی کـورێکی دلڕەقــە ، ئەگــەر زەردبــوو کـورێکی دووڕوە، ئەگـەر قورقوشمبـوو کوڕێکی نێرەمووکە.

**سمـور**[1] **:** (نابلـسی) دەڵێـت: سمـۆرە پیاوێکی ستەمکاری دزە و رووده‌کاتـە چۆڵەوانیەکان چونکە ماڵ‌و سامانەکەی سوودی لێوەرناگرێ دوای مردنی خـۆی نەبێت.

**سمی مانگاو شتیتر:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ئەگـەر نـەبوو بەلگەیـە لەسـەر مانـدوبوون‌و هەولـدان‌و یـەککرتنی ژن‌و مێردو باوك‌و دایك.

**سمێـڵ:** (نابلـسی) دەڵێـت: لەخــەودا بەلگەیـە لەسـەر مـاڵ‌و سـامان، ئەگـەر بینـی مـووی سمێڵـی کورتدەکاتـەوە لەسوننەتدا باشە.

*ئەگـــەر بینـــی مـــووی سمێڵـــی زیـــادیکردووەو درێـــژبوە خراپـــە لەسوننەتدا.

---

[1] **سمور:** گیاندارێکە لە(سمۆرە)دەچێت.

(وەرگێڕ)

*ئەگەر بینی مووی سمێڵی کورتبوەتەوە یاخود کورتیکردوەتەوە بەو ئەندازەیە ماڵەکەی خەرجدەبێت.
*ئەگەر بینی مووی سمێڵی بەئەندازەی خۆیو لەسروشتی تایبەتی دەرچوەو رێگرە لەنانخواردن خراپەو بیدعەیە.
*سمێڵی درێژ بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە، دەگونجێت بەخواردنەوەی حەرامکراوەکان ناوبانگ دەربکات، کورتکردنەوەو جوانکردنی بەڵگەیە لەسەر شوێنکەوتنی سوننەت.
*تاشینی سمێڵو ریش بەڵگەیە لەسەر پشوو رەواندنەوەی غەمو پەژارە بەتایبەت لای ئەوانەی بەباشی دەزانن، لای ئەوانەی بەخراپی دادەنێن بەڵگەیە لەسەر لەکیسچوونی پلەوپایەو ناوبانگی خراپو هەژاریو زەرەر.
*کەمی مووی سمێڵ دامرکانەوەیە زیادەی خراپە، دەگونجێت زیادبوونی بەڵگەبێت لەسەر پارەخواردنی سەرخۆشو مەست یان رێگری لەزەکات یاخود دەستگرتن بەسەر ئەسپەردەو ئەمانەتدا.



**سندووق**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: سندووق ژنە یان کچە، (قەیرەوانی) سندووقی بەزوبانی خۆی باسکردوەو بە(تابوت) ناوزەدیکردوەو دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر:
+ماڵ.
+هاوسەر.
+فرۆشگاو دوکان.
+گەنجینەو سینەی.
*ئەگەر هاوسەرەکەی دووگیانبوو کوڕێکی دەبێت، ئەگەر کاڵایەکی هەبوو زەرەردەکات یاخود پاشگەزدەبێتەوە لێی.
(نابلسی) دەڵێت: سندووق هاوسەرە بۆ کەسێکی رەبەنو دەوڵەمەندییە بۆ هەژار، سندووقی سەفەر سەفەر یا نوێنەرە.

**سنگ( سینە )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: سینە تەنگی وێڵیو سەرگەردانییە، ئەگەر کەسێکی ناموسوڵمانی بینی سینەی تەنگە زەرەر دەکات لەماڵو ساماندا.
*هەروەها دەڵێن: فراوانی سینەی مرۆڤ دەستو دڵفراوانییەو تەنگی رژدییە.
*زۆری سوو بەسەر سینەوە قەرزارییە تووشی مەردوم دەبێت.
*ئەگەر بینی بوە بەبەرد دڵڕەق دەبێت.

*پیاوێك هات بۆلای (ئیبن سیرین)و وتی: موویەکی زۆرم دی لەسەر سینەم دەرهاتبوو منیش لوولمدەکرد، ئەویش وتی: ئەمانەتێکت پێ سپێراوەو گەیاندوتە جێی خۆی.

*هەروەها سینەفراوانی بەڵگەیە لەسەر هێمنیو لەسەرخۆیی.

(نابلسی) دەڵێت: فراوانی لەخەودا بۆ بێباوەڕ بەڵگەیە لەسەر موسوڵمانبوونی بۆ کەسێکی سەرپێچیکار تەوبەیەو فراوانیشە بۆ گوێڕایەڵ.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئاسانکردنی کاری قورسو گران.

*ئەگەر خۆشەویستەکەی لەسنگی خۆیدا بینی بەڵگەیە لەسەر ناڕەزایی لەدەستی، ئەگەر نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی لەو نەخۆشییەی گرتوویەتی.

*دەگونجێت باشی سینە بەڵگەبێت لەسەر خۆنەویستی.

*دەگونجێت سینە بەڵگەبێت لەسەرئەوەی تێدا دەشارێتەوە لەزانیاریوماڵو ڕێنومایی یان وێڵیو سەرگەردانی.

*سینە میوان یا ژن یاخود پلەوپایەیەکە تێدا کۆدەبێتەوە.

*سینە لانەی غەمو پەژارەو دەروە، ئەگەر بینی سینەی فراوانبوە خۆشیو شادی بەدەستدەهێنێت، ئەگەر بینی سینەی تەنگبوە تەنگەبەری بەدەستدەهێنێت، ، هەروەها دەڵێن: فراوانبوونی بۆ ئیسلامەو تەنگی بۆ یاخیبوونو گومڕاییە.

*ئەگەر بێباوەڕێك بینی سینەی فراوانبووە، سەلامەتو سوودمەند دەبێت لەبازرگانیدا.

*ئەگەر ئێشو ئازاری بەسینەیەوە دی گوناهێکی ئەنجامداوەو پاشان سزادراوە ، هەروەها دەڵێن: ماڵو دارایی خەرجدەکات لەزیادەڕەویو کاری لاوەکیدا بەبێ ئەوەی لەگوێڕایەڵی پەروەردگارا بێتو سزا دراوە لەسەری.

*ئەگەر پیاوێك دوو مەمکی لەسەر سینەی خۆی دی هاوسەردەگرێ ئەگەر ڕەبەن بێت یاخود تووشی عیشق دەبێو پاشان ئابڕووی دەچێت.

**سنوور:** (نابلسی)دەڵێت: بۆیەکێك داوای بکات یان داوای نەبەزاندنی بکەن لێی بەڵگەیە لەسەر قەرزو داواکردنی دانەوەی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رامانی مرۆڤ لەسنووری خۆیدا یاخود هاوسەرگیری بۆ رەبەن و دامەزراندنی.

**سنەوبەر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سنەوبەر پیاوێکی دووری دەنگبەرزە سووك و رەوشت نزم و رژدە، ستەمکارو دز رووی تێدەکات.

*ئەو دەرگایەی لەداری سنەوبەر دروستدەکرێ دەرگاوانێکی رەوشت خراپی ستەمکارەو بۆ بازرگانیش پارێزەرێکی ستەمکاری دزە.

## س و

**سوار(ئەسپسوار):** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر چاودێری و دڵڕاگرتن و گەیشتن بەهیواو ئاوات بەماندوبوون و هیلاکی.

**سواربوون:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی سواری ئاژەڵێکبوە، ئارەزوویەکی زاڵدەچێتە ئەندێشەو بیری و دوایدەکەوێ.

*سواربوونی هەموو ئاژەڵێك مەزنی و دەستەڵاتە.

*ئەگەر بینی سواری ئەسپێکبوەو باش ناتوانێ سوراچاك بێت دوای ئارەزووی خۆیدەکەوێ، ئەگەر بەباشی سواربوو پارێزراو سەلامەتدەبێت.

*ئەگەر بینی سواری ئەسپێکبوە بەهەموو پێداویستیەکیەوە خاوەن لانەو ماڵبوو لەگەڵ خزمەتکارو بەردەست مەزنی باویاپیرو دەستەڵاتەکەیەتی و دەگات پێی.

*ئەگەر سواری ملی پیاوێکوبووبو بەزۆر دەمرێت و تەرمەکەی هەڵدەگرن بەزۆر ، ئەگەر بەویستی خۆی سوارییبوو ئەوەی کەسواریدەبێت ئەرك و نارەحەتی سوارە هەڵدەگرێ بەویستی خۆی.

*هەروەها دەڵێن: رووداوێکی سەخت و گرانە، ئەگەر فرێیداو وازیلێهێنا روونادات، ئەگەر بەپشتاوپشت سواربوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی بەهانە پەسەند ناکات و گوێناگرێ لەئامۆژگاری یاخود پشت هەڵدەکات لەکاتی پێویستیدا یان لەدواوە یاخود لەکاتی خولی مانگانەدا دەچێتە لای ژن.

**سواڵکەر (داواکار):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سواڵکەری هەژار لەخەودا زانستخوازە ، ئەگەر ئەوەی داوایکرد پێی درا ئەوە ئەو زانیارییە بەدەستدەهێنێت و ملکەچی و خۆبەکەمزانینی لەگەڵدا دەبێت.

(نابلسی) دەڵێت: سواڵکەران بەڵگەن لەسەر غەمو پەژارەو فیکرو بۆچوونێك روو لەدەرووندەکات.

* ئەگەر بینی پارەیەکی لێوەردەگرن نارەحەتیەکی توند دەهێنێتە پێش چاوی‌و لەگەڵ مەرگی خەوبینەرو مەرگی ئەوەی کاروبارەکانی گرنگە لەلای، ئەگەر بینینی خۆیاندەکەن بەماڵەکەیدا، یاگوندەکەی لەیەکترازا روو لەخانەوادەکەی دەکات، ئەگەر شتێکیان لەو ماڵە برد بەڵگەیە لەسەر زیانێکی گەورە.

* سواڵکەر خوێندکارەو بەرپرسیش زانایە.

* ئەگەر بینی سواڵدەکات بەلام نایدەنێ ملکەچدەبێت.

* ئەگەر سواڵکەرێکی بینینی لاڵبوە بەڵگەیە لەسەر عەورەتی ژنێك لەکاتی مارەبڕیندا، ئەگەر ئاویاندایە هاوسەرگیری‌و مارەبڕینە.

(نابلسی) دەڵێت: کەسێکە پەڕۆکۆنەو وەرەقە کۆدەکاتەوە لەرێگەوباندا، هەروەها بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کۆکردنەوەی ماڵی حەلاڵ‌و حەرام‌و دەرخەری نهێنی‌و پرسیارکار لەشتێك پەیوەندی بەوەوە نییە.

**سوبیا**[1]: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پشوو رزق‌و رۆزی‌و گەیاندنی خراپە بەوەی دەیخواتەوە.

* ئەگەر خەوبینەر رەبەنبوو دەگونجێت ژنی تەلاقدراو حەلاڵبکات.

**سوپاسگوزاری**: (نابلسی) دەڵێت: سوپاسگوزاری خوداوەند لەخەودا قوتاربوونە لەغەم‌و پەژارەو دڵتەنگی.

* ئەگەر بینی سوپاسی خوداوەند دەکات لەغەم‌و پەژارە قوتاردەبێ‌و، هێزو ماڵ‌و سامان‌و خێرو فەرو پاداشتی دەستگیردەبێت.

* ئەگەر فەرمانڕەوابوو ناوچەیەکی ئاوەدانی پێدەسپێردرێ.

* ئەگەر بینی سوپاسی پەروەردگار دەکات یەکتاپەرستە.

* هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی سوپاسی خوداوەند دەکات ئەگەر ناموسوڵمانبوو موسوڵمان دەبێت.

* ئەگەر دووڕوبوو دڵسۆز دەبێت، ئەگەر موسوڵمانبوو هاوەلایەتی پیاوێکی بەڕێزو مەزندەکات لەمەترسیەکی بەناوبانگی دووردا.

---

[1] **سوبیا**: بادەیەکی بەناوبانگە لەگەنم دروستدەرکرێ (اللسان: مادة سوب).

**سورام**[1] : (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی چاکەکارە لەنێوان خەڵکیدا لەمیراتیدا.

**سورێژە( درکە )**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: سورێژە بەدەستهێنانی ماڵو داراییە لەلایەن دەستەڵاتدارەوە لەگەڵ خەمو پەژارەو ترس‌وبیم‌و تیاچوونیدا. هەروەها وتراوە: توهمەو تاوانبارکردنە. (نابلسی)دەڵێت: سورێژە بەلاو نەهامەتی کشتوکاڵە.

**سورێنچك**: (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر لەش ساغی‌و نەخۆشی.

**سولەیمان( سەلامی خوای لێبێت )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی (سولەیمان) ببینێ موڵك‌و دەستەڵات‌و زانیاری‌و فیقهی دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر بەمردوویی بینی لەسەر دوانکە بەرپرس یا سەرکردەو فەرمانڕەوا دەمرێ‌و بەمەرگی نازانێت هەتا دوای ماوەیەك.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر (سولەیمان) ببینێ فەرمانڕەواو دوژمن ملکەچی دەبن‌و زۆر سەفەر دەکات.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر موڵك‌و دەستەڵات بۆ یەکێك شایستەی بێت یاخود بەڵگەیە لەسەر دادگاو دادگایی فیقهو فەتوا بۆ ئەوەی شایستەیەتی بەتایبەت ئەگەر تاجەکەی یا ئەوستیلەکەی هەڵگرت یاخود لەسەر جێگەی خۆی داینا، دەگونجێت کاری قورس‌وگرانی بۆ ئاسان ببێت‌و لەلایەن پەروەردگارەوە پلەوپایەی بەرزی دەستگیرببێت‌و چارەنووس‌و دەرەنجامی بەخێر کۆتایی بێت.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ناڕەحەتی لەلایەن ژنانەوەو بۆڵە بۆڵ لەدوولاوە، ئەگەر خەوبینەر دەستەڵاتداربوو لەپۆستی دەستەڵات لادەبرێ پاشان دەگەڕێتەوە بۆی‌و دەگونجێت بەفرۆفێڵ ژنێکی خاوەن ماڵو دارایی بەرێز بکات بەهاوسەری.

*ئەگەر خەوبینەر رزق‌و رۆزی لەسەر باڵندەبوو یان ئامادەکاری روحی جنۆکە یاخود شووشەکاری رزق‌و رۆزییەکی فراوانی دەستگیردەبێت ، دەگونجێت ماڵێکی گرانبەهای بۆ وەبەربێت دوای نائومێدی.

*دەگونجێت سەربکەوێت بەسەر دوژمنەکەیدا دوای زەرەر پێبردنی.

---

[1] **صرام**: ناوێکە لەناوەکانی جەنگو شەڕ. (وەرگێڕ)

*ئەگەر خەوبینەر لەوانەبوو بەدەریادا سەفەریاندەکرد لەسەر رەشەبا وەستابوون یاخود ئەوەی پێویستی پێیەتی بەدەر لەسەفەر خوازو داواکەی بۆ بەجێدێت.

*ئەگەر (سولەیمان) پێغەمبەری بینی نیعمەت و بەخششی خوایی بەسەریا دەرژێت ، دەگونجێت زانینێکی تەواوی پێببەخشرێ.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر شارەزابوون لەزانیاری زمان وەك وەرگێڕان.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر لەشساغی نەخۆش چونکە ناوی (پارێزراوە) هەروەك چۆن ناوی (دڵنیاییە).

*بینینی ئەموستیلەکەی(سەلامی خوای لێبێت) نوێکردنەوەی ئەمەکدارییە بۆ خاوەن بڕیار.

*ئەگەر حەزرەتی (سولەیمان) ببینێ ماڵو دارییەکی زۆر بەدەستدەهێنێ سەفەرێکی دووری دەکەوێتەبەر ، بەڵام زوو دەگەڕێتەوە و خێرو سەلامەتی لێدەستگیردەبێت.

**سوێندخواردن:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: سوێندخواردن لەبنەڕەتدا بەڵگەیە لەسەر لەخۆباییبوونو فێڵو تەڵەکە بەپێی ئایەتی: ﴿ وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ ، فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ ﴾ هەروەها ئایەتی: ﴿ فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ﴾سوێندی راستیش سەرکەوتون زاڵبوونەو وتەی حەق و راستە بەپێی ئایەتی: ﴿ وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴾ سوێندی درۆش ملکەچی و سەر شۆڕییە لەگەڵ ئەنجامدانی سەرپێچی و گوناهو هەژاری بەپێی ئایەتی : ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَهِينٍ ﴾ .

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بەشێوەیەکی مەجازی سوێندیخوارد فێڵو دەستبڕینە.

*ئەگەر لەخەودا سوێندی بەخاچ یا ئەستێرە یان دەریا خوارد بەڵگەیە لەسەر هەواداری بۆ سەرگەردانی و دووڕوویی.

*ئەگەر سوێندی بەپەروەردگارخوارد یاخود سوێندێك کەفارەتی بکەوێتە ئەستۆ بەڵگەیە لەسەر شوێنکەوتنی حەق و راستی و شوێنکەوتن و پابەندی پێغەمبەری خوایە(ﷺ).

*سوێندخواردنی مرۆڤ لەژنەکەی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خەمو خەفەت و ئەوەی پێویستی دەکات

سوێند بەباوباپیرانو دایك بخورێت بۆی.

**سوێندخواردن بە پەروەردگار:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر سوێندەکەی بەدرۆبێت هەژاریو ملکەچیو دەستبڕینە، دەگونجێت سوێندی درۆو وێرانبوونی ماڵبێت بۆیەکێك بیخوات.

*سوێندی زانست کارێکی چاکە یاخود دڵنیاییە لەترسو بیم.

## س وو

**سووپەر( قەڵغان ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر لەبەریبکات بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی بەهێزو جوانو شۆخو شەنگو خاوەن ماڵودارایی.

(نابلسی)دەڵێت: سووپەر مەزنیو هێزو سەرکەوتنو ماڵو داراییەو لەبنەڕەتیشدا میراتییە.

**سووپەرساز( قەڵغانچی ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مامۆستایەکی بانگخوازە بۆ خێرو چاکە، هەروەها دەڵێن: دەستەڵاتدارە.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئاسانکردنی کاروبای قورسوگرانو یارمەتیدانو هاوسەرگیری بۆکەسی رەبەن.

*سووپەرساز پیاوێکە خەڵکی فێری ئەدەبو زانیاریدەکاتو رێنوێنییاندەکات بۆ رەوشتی بەرزو باڵا بەڵام دووڕوویی تێکەڵە.

**سوودمەند( بەسوود ):** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر هاوسەر بۆ رەبەنو تەواوبوون لەکارو فرمان.

**سوراحی**[1] **:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا کچ یان ژنێکی پلەوپایەبەرزەو ناپاکی قبوڵناکات.

**سووربوون لەسەر کارێك:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر هات بەسەر نەخۆشدا تەمەنی بەسەردەچێ یاخود رۆژانی غەریبی کەسێك زۆر دەخایەنێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پاراستنی ئەوەی بەڵگەیە لەسەری.

**سووربوونی ریش:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا فیتنەیەو بەتایبەت ئەگەر تاڵەمووی سپی تێکەڵبوو لەخەودا، دەگونجێت لەبنەڕەتدا سوورێك بێت سپی تێکەڵ ببێت.

**سوورەتەکانی قورئان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: (حەسەن) لە(قتادە)وە دەگێڕێتەوە پیاوێکدەمرێتو براکانی

---

[1] **سوراحی:** لای عەرەب پتر بۆ تێکردنی مەی بەکارهاتووە. (وەرگێڕ)

لەخەودا دەیبینن، ئەوانیش لێی دەپرسن: برای شیرینمان چ کارێك وەردەگیرێ‌و باشە ، دەڵێت: قورئان، پاشان دەپرسن: چیتر قورئان؟ دەڵێت: (ئایەتەلکورسی) پاشان دەپرسن : تکا بۆ خەڵکیدەکرێ؟ دەڵێت: بەڵێ، ئێوەکاردەکەن‌و نازانن بەلام ئێمە دەزانین‌و کارناکەین.

(نابلسی) دەڵێت: ئەو سوورەتانەی بەسەر مردوودا دەخوێنرێتەوە زوربەی بەلگەیە لەسەر مەرگی نەخۆش.

*خوێندنی سوورەتێك خۆشی‌و شادییە لەگەڵ رزق‌و رۆزی‌و نوێكاری‌و كورێكی قورئانخوێن.

*سوورەتی قورئان ژنە یاخود كوڕ یان درهەم‌و دینارە بەئەندازەی ئەوە.

*دەگونجێت سوورەت ئەگەر (مەكی) یا (مەدنی)بێت وەك سوورەتی (مائدة) و(أنعام)و (نحل)و (حج)و (لقمان)و (سجدة)و (تغابن) بەلگەبێت لەسەر (حەج) چونكە سوورەتە (مەكیی مەدەنییەكان) بەو چەشنە هەڵمسەنگاندوە.

(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی سوورەتی (فاتحە) دەخوێنێ دەروازەكانی خێری بۆ دەكرێتەوەو دەروازەكانی شەڕی لێدادەخرێت.

*ئەگەر بینی سوورەتی (البقرة)دەخوێنێت تەمەنی درێژ دەبێت‌و ئاینی باشدەبێ.

*ئەگەر بینی سوورەتی (ال عمران) دەخوێنێت مێشكی سافدەبێت‌و نەفسی پاكدەبێتەوەو دەبێت بەمشتومەڕكار لەبەرانبەر پەیڕەوانی ناحەقی.

*ئەگەر سوورەتی (النساء) ی خوێندەوە میراتی دابەشدەكات‌و خاوەن ژن‌و كچ دەبێت‌و دوای تەمەنێكی دووردرێژ میراتی بەجێدەهێڵێ.

*ئەگەر سوورەتی (المائدة) ی خوێندەوە پلەوپایەو ناوبانگی بەرزدەبێتەوەو دڵنیایی‌و خواناسی پتەودەبێت.

*ئەگەر سوورەتی (الانعام) ی خوێندەوە ئاژەڵی زۆردەبێت‌و رزق‌و رۆزی بەرین‌و فراواندەبێت‌و خۆشی دەست‌و دڵفراواندەبێت.

*ئەگەر سوورەتی (الاعراف)ی خوێند لەدنیا دەرناچێ هەتا نەچێت بۆ (سیناء).

*ئەگەر سوورەتی (الانفال)ی خوێندەوە خوداوەند زاڵبوون‌و سەركەوتنی بەسەر دوژمناندا

پێدەبەخشیٚو دەستکەوت بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر سوورەتی (التوبة) ی خوێندەوە بەباشیو پلەوپایەداری لەنێو خەڵکیدا دەژیو بەتەوبەوە دەمرێت.

*ئەگەر سوورەتی (یونس)ی خوێند بەندایەتی باشدەبێتو پلانو خراپەی جادووگەران زیانی پێناگەیەنێت.

*ئەگەر سوورەتی (هود)ی خوێندو وەچەو كشتوكاڵی پێدەبەخشریٚ.

*ئەگەر سوورەتی (یوسف)ی خوێندو ستەمیلێكرا یان نا بەلاٚم لەكۆتاییدا دەبێت بەخاوەنی خوازی خۆیو سەفەر دەكاتو لەو شوێنە نیشتەجێدەبێت.

*ئەگەر سوورەتی (الرعد)ی خوێند دوعاو نزاكان دەپارێزیٚو پاشان زوو پیر دەبێت.

*ئەگەر سوورەتی (ابراهیم)ی خوێند ئاینو كاروبارەكانی لای پەروەردگار پەسەند دەبن.

*ئەگەر سوورەتی (الحجر)ی خوێند لای خواو خەڵكی بەباشەو پەسەندكراو ناو دەبریٚ.

*ئەگەر سوورەتی (بنی اسرائیل - اسراء)ی خوێند لای خوداوەند بەرێنوماییدەر ناوزەد دەكریٚو بەسەر دوژمناندا سەردەكەویٚ.

*ئەگەر سوورەتی( الكهف)ی خوێند بەئومێدەكانی خوێدەگاتو تەمەندرێژ دەبیٚ هەتا لەژیان بێزاردەبیٚو خوازیاری مەرگدەبێت.

*ئەگەر سوورەتی( مریم)ی خوێند سوننەتی پێغەمبەران (سلاٚوی خوایان لێبێت) زیندوو دەكاتەوەو درۆی بەدەمەوە دەكریٚو پاشان پاكێتی دیاریدەدات.

*ئەگەر سوورەتی (طه) ی خوێند جادووی جادووگەران هیچ زیانێكی پێناگەیەنێت.

*ئەگەر سوورەتی (الأنبیاء) ی خوێند دەرووی لێدەكرێتەوە دوای سەختیو نارەحەتیو زانیاریو ملكەچی پێدەبەخشریٚ.

*ئەگەر سوورەتی(الحج) ی خوێند چەند جارێك (حەج)دەكات.

*ئەگەر سوورەتی (المؤمنون) ی خوێند ئیمانو باوەڕی بەهێز دەبێتو بەو حاڵەوە دوایی بەكردارەكانی دێت.

*ئەگەر سوورەتی (النور)ی خوێند خوداوەند دڵو گۆڕی ڕووناكدەكاتەوە.

*ئەگەر سوورەتی(الفرقان) ی خوێند حەقو ناحەق لەیەكجیادەكاتەوە.

*ئەگەر سوورەتی (الشعراء) ی خوێند خوداوەند لەخراپە دەیپارێزێ.
*ئەگەر سوورەتی (النمل)ی خوێند موڵكو دەستەلاتی پێدەبەخشرێ.
*ئەگەر سوورەتی (القصص) ی خوێند گەنجێكی حەلاڵی پێدەبەخشرێ.
*ئەگەر سوورەتی (العنكبوت) ی خوێند لەژێر سایەو پارێزراوی خوداوەندا دەبێت هەتا دەمرێت.
*ئەگەر سوورەتی (الروم)ی خوێند خوداوەند لەسەر دەستی ئەودا شارو ولاتانی دی ئازاد دەكات.
*ئەگەر سوورەتی (لقمان)ی خوێند دانایی پێدەبەخشرێ.
*ئەگەر سوورەتی (السجدة)ی خوێند لەكڕنووشدا دەمرێتو لەبراوەكان دەبێت لای پەروەردگار.
*ئەگەر سوورەتی (السجدة) ی خوێند بانگەوازدەكات بۆ لای حەقو راستیو خۆشەویستانی زۆر دەبن.
*ئەگەر سوورەتی (الاحزاب) ی خوێند لەحەقیەروەرو خواناساندەبێت.
*ئەگەر سوورەتی (سبأ)ی خوێند لەدنیادا گۆشەگیرو لەدنیا نەویستاندەبێت.

*ئەگەر سوورەتی (فاطر) ی خوێند خوداوەند دەرگاكانی نیعمەتو بەخششی خۆی بۆ ئاوەلادەكات.
*ئەگەر سوورەتی (یس) ی خوێند خۆشەویستی خانەوادەی پێغەمبەری (ﷺ) پێدەبەخشرێ.
*ئەگەر سوورەتی (الصافات)ی خوێند خوداوەند كوڕێكی خاوەن دڵنیایی پێدەبەخشیو گوێڕایەڵیدەكات.
*ئەگەر سوورەتی (ﷺ)ی خوێند ماڵو سامانو وریاییو زرنگی لەپیشەكەیدا زیاد دەكات.
*ئەگەر سوورەتی (الزمر)ی خوێند لەئاینەكەیدا دڵسۆز دەبێتو دەرەنجامو چارەنووسیشی باشدەبێ.
*ئەگەر سوورەتی (المؤمن) ی خوێند لەدنیاو قیامەتدا بەرزیو شكۆمەندی پێدەبەخشرێو خێروچاكە لەسەر دەستی ئەو بەدی دێت.
*ئەگەر سوورەتی (الشوری) ی خوێند تەمەنێكی دوورودرێژ بەسەر دەبات.
*ئەگەر سوورەتی (الزخرف)ی خوێند راستگۆ دەبێت لەوتەكانیدا.
*ئەگەر سوورەتی (الدخان)ی خوێند راستگۆ دەبێت لەوتەكانیدا.

*ئەگەر سوورەتی (الجاثیة) ی خوێند بەدرێژایی تەمەن ملکەچی پەروەردگارەکەی دەبێت.

*ئەگەر سوورەتی ( الاحقاف) ی خوێند شتی سەیرو سەمەرە لەدنیادا دەبینیٚ.

*ئەگەر سوورەتی (محمد)ی (ﷺ) خوێند ژیاننامەی باشدەبیٚ.

*ئەگەر سوورەتی (الفتح)ی خوێند سەرکەوتوو دەبێت لەجیهادا.

*ئەگەر سوورەتی (الحجرات)ی خوێند پەیوەندی خزمایەتی بەجێدەگەیەنێت.

*ئەگەر سوورەتی (ق)ی خوێند رزق و رۆزی فراواندەبێت.

*ئەگەر سوورەتی (الذاریات)ی خوێند وەچەو کشتوکاڵی پێدەبەخشریٚ.

*ئەگەر سوورەتی (الطور) ی خوێند خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەبێت بەجێنشینی(مەککە).

*ئەگەر سوورەتی (النجم) ی خوێند کورێکی جوانکیلەو ژیری رێنومابیدەری پێدەبەخشریٚ.

*ئەگەر سوورەتی (القمر)ی خوێند جادووی لێدەکریٚ بەلاّم زیانی پێناگەیەنێت.

*ئەگەر سوورەتی (الرحمن)ی خوێند لەدنیادا نازو نیعمەت بەدەستدەهێنێت و لەقیامەتیشدا سۆزو بەزەییە.

*ئەگەر سوورەتی (الواقعة) ی خوێند پێشرەو دەبێت لەگوێرایەڵیدا.

*ئەگەر سوورەتی (المجادلة) ی خوێند مشتومڕکار دەبێت لەگەڵ ناحەق پەیڕەوان و بەبەڵگەکانی هەموویان دەبەزێنی.

*ئەگەر سوورەتی (الحشر)ی خوێند خوداوەند دوژمنەکانی تیادەبات.

*ئەگەر سوورەتی (الممتحنة) ی خوێند نارەحەتی و پاداشتی پێدەبەخشریٚ.

*ئەگەر سوورەتی (الصف)ی خوێند شەهید دەکریٚ.

*ئەگەر سوورەتی (الجمعة) ی خوێند خوداوەند خێرەکانی بۆ کۆدەکاتەوە.

*ئەگەر سوورەتی (المنافقون)ی خوێند لەدووڕوویی پارێزراو دەبێت.

*ئەگەر سوورەتی (التغابن)ی خوێند چەسپاوو جێگیر دەبێت لەسەر رێنومایی.

*ئەگەر سوورەتی (الطلاق) ی خوێند بەڵگەیە لەسەر روودانی ناکۆکی

لــــەنێوان خـــۆیو هاوســــەرەکەیداو لەئەنجامدا دەبێتەهۆی جیابوونەوەیان.
*ئەگـەر سـوورەتی (الملـك)ی خوێنـد موڵكو زەویو زاری زۆر دەبێت.
*ئەگەر سوورەتی (ن - القلم)ی خوێنـد نووسینو رەوانبێژی پێدەدرێت.
*ئەگـەر سـوورەتی (الحاقـة)ی خوێنـد لەسەر حەقدەبێت.
*ئەگەر سوورەتی (المعـارج)ی خوێنـد دڵنیاوسەرکەوتوو دەبێت.
*ئەگــەر ســوورەتی (نــوح)ی خوێنــد فــــەرمان بەچــــاکەو رێگـــــری لەخراپەدەکاتو بەسەر دوژمنانـدا زاڵو سەرکەوتوو دەبێت.
*ئەگــەر ســوورەتی(الجــن)ی خوێنــد پــارێزراو دەبێــت لەشــەڕو خراپــەی جنۆکە.
*ئەگـەر سـوورەتی (المزمـل)ی خوێنـد رێنوێنی دەکرێ بۆ شەونوێژ.
*ئەگەر سوورەتی(المدثر)ی ی خوێنـد ژیاننامــەی باشــدەبێتو بەکەســێکی بەئارامو دانبەخۆداگرتوو دەبێت.
*ئەگەر سـوورەتی (القیامـة) ی خوێنـد خــۆی لەســوێند دەپــارێزێو هــەرگیز سوێند ناخوات.
*ئەگەر سـوورەتی (الانـسان)ی خوێنـد بــۆ دڵفراوانــی رێنــوێنی دەکرێــتو سوپاســگوزاری پێدەبەخــشرێو ژینــی خۆشدەبێ.
*ئەگەر سوورەتی (المرسلات)ی خوێند رزقو رۆزی بۆ فراواندەبێت.
*ئەگــەر ســوورەتی (عــم)ی خوێنــد پلەوپایــەو ناوبــانگی بەرزدەبێتــەوەو بەباشی باسیدەکەن.
*ئەگەر سوورەتی (النازعات)ی خوێنـد ناپاکیو غەمو پەژارە لەدڵیدا لادەبرێ.
*ئەگەر سوورەتی (النازعات)ی خوێنـد ناپاکیو غەمو پەژارە لەدڵیدا لادەبرێ.
*ئەگـەر سـوورەتی( عـبس)ی خوێنـد لەکاتی زەکاتدا خێر دەکات.
*ئەگەر سـوورەتی (التکـویر)ی خوێنـد ســەفەر زۆردەکــات لەخۆرهەڵاتــەوەو ســـوودو قازانجیـــشی لەســـەفەردا زۆردەبێت.
*ئەگەر سـوورەتی (الانفطـار)ی خوێنـد دەســــتەڵاتداران نزیکدەکەنــــەوە لەخۆیانو رێزیدەگرن.
*ئەگــــەر ســــوورەتی (المطففــــین) ی خوێنـد ئەمانـەتپارێزیو ئەمەکـداریو دادپەوەری پێدەبەخشرێ.
*ئەگەر سوورەتی (الانشقاق)ی خوێنـد وەچەو کوڕی زۆر دەبێ.
*ئەگـەر سـوورەتی (الـبروج)ی خوێنـد بەســەر غــەمو پەژارەیــدا زاڵــدەبێو

بــەجۆرێك زانیــاری رێــزدار دەكــرێ، وتراویشە زانیاری ئەستێرەناسیە.

*ئەگـەر سـوورەتی (الطـارق)ی خوێنـد زۆر یادی خواو تەسبیحات دەكات.

*ئەگــەر ســوورەتی (ســبح)ی خوێنــد كاروبارەكانی بۆ ئاساندەبێت.

*ئەگەر سوورەتی (الغاشیة)ی خوێنـد پلەوپایــەو ناوبــانگی بەرزدەبێتــەوە لەگەڵ زانیاریدا.

*ئەگــەر ســوورەتی (الفجــر)ی خوێنـد شانو شەوكەتو سامی پێدەبەخشرێ.

*ئەگــەر ســوورەتی (البلــد)ی خوێنــد سەركەوتوو دەبێت لەناندان بەهــەتیوو لاوازو نەداراندا.

*ئەگەر سـوورەتی (الـشمس)ی خوێنـد تێگەیشتنو زرنگی پێدەبەخشرێ.

*ئەگــەر ســوورەتی (اللیــل)ی خوێنــد رێنــوێنی دەكرێــت بــۆ شــەونوێژو لەدەركـــــــەوتنی نهێنیـــــــەكانی پارێزراودەبێ.

*ئەگەر سوورەتی (الـضحی) ی خوێنـد رێز لەهەتیوو بێنەوایاندەگرێ.

*ئەگـــەر ســـوورەتی (الم نـــشرح، انــشراح)ی خوێنـد خوداوەنـد سـینەی ئاوەڵادەكات بۆ ئیسلامو كاروبـاری بـۆ ئاســـاندەكاتو غـــەمو پـــەژارەكانی دەڕەوێتەوە.

*ئەگەر سوورەتی (التین)ی خوێنـدەوە بەجێهێنانی پێداویستیەكانی بـەخێرایی بــۆ بــەدی دێـــتو رزقو رۆزی بــۆ ئاساندەبێت.

*ئەگەر سوورەتی (اقرأ) ی خوێنـدەوە نووسـینو رەوانبێـژیو خۆبەكـەمزانینی پێدەبەخشرێ.

*ئەگەر سوورەتی (القدر)ی خوێنـدەوە تەمەندرێژ دەبێتو كاروبارو پلەوپایـەی بەرزدەبێتەوە.

*ئەگـەر سـوورەتی (لم یكـن، البیِّنَـة)ی خوێنــدەوە خوداوەنـد لەسـەر دەسـتی ئــەودا كۆمــەڵێكی ویــڵو ســەرگەردان رێنوێنیدەكات.

*ئەگـــــەر ســـــوورەتی (الزلزلـــــة) ی خوێندەوە خوداوەند قاچی بێباوەڕانی پێدەهێنێتە لەرزە.

*ئەگەر سوورەتی (العادیـات)ی خوێنـد ئەسپو وابەستەكانی پێدەبەخشرێ.

*ئەگـــــەر ســـــوورەتی (القارعـــــة)ی خودێنــدەوە بەبەندایــەتیو خواناســی رێزدار دەكرێ.

*ئەگـــەر ســـوورەتی (التكـــاثر)ی خوێندەوە پـارەوماڵنەویسـت دەبێـتو واز لەكۆڕو كۆبوونەوەی خۆیدەهێنێت.

*ئەگەر سوورەتی (العصر)ی خوێندەوە ڕێنوێنی دەکرێ بۆ ئارامگرتن و دادەنرێ بەسەر حەقپارێزیو لەبازرگانیەکەشیدا زیاندەکات و دواتر خێرێکی زۆری دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر سوورەتی (الهمزة)ی خوێندەوە ماڵو سامانێك کۆدەکاتەوە لەکاری چاکەو خێردا سوودی پێدەگەیەنێت.

*ئەگەر سوورتی (الفیل)ی خوێندەوە زاڵدەبێت بەسەر دژومنانداو ئازادکردن لەسەر دەستی ئەودا ڕوودەدات.

*ئەگەر سوورەتی (قریش)ی خوێندەوە نانددەدات بەهەژاران و خوداوەند تەبایی و خۆشەیستی دەخاتە نێو دڵی ئەوو بەندەکانیەوە.

*ئەگەر سوورەتی ((أرأیت) ی خوێندەوە زاڵدەبێت بەسەر ئەوەی ڕووبەڕووی دەوەستیو پێچەوانەیەتی.

*ئەگەر سوورەتی (الکوثر)ی خوێندەوە خێروچاکەی لەدنیاو قیامەتدا زۆردەبێت.

*ئەگەر سوورەتی (الکافرون)ی خوێندەوە ڕێنوێنی دەکرێ بۆ جەنگان لەدژی بێباوەڕان.

*ئەگەر سوورەتی (النصر)ی خوێندەوە خوداوەند زاڵو سەرکەوتوویدەکات بەسەر دوژمناندا، ئەم خەونەش بەڵگەیە لەسەر نزیکی مەرگی خاوەنەکەی چونکە سوورەتی هەواڵدەری مەرگی پێغەمبەر(ﷺ)بوو.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: من لەخەودا بینیم سوورەتی (الفتح)م دەخوێندەوە، ئەویش وتی: وەسیەت بکە چونکە ئەجەلو چارەنووسی تۆ لەبەرئەوەی وتراوە دوایین سوورەتە لەئاسمانەوەدابەزیوە.

*ئەگەر سوورەتی (تبت یدا)ی خوێندەوە هەندێك لەدووڕووان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ دژایەتی و هەوڵدەدەن قاچی هەڵبخلیسکێ پاشان خوداوەند تیایدەبات.

*ئەگەر سوورەتی (الاخلاص)ی خوێندەوە بەهیواو ئاواتی خۆیدەگات و بەمەزن ناودەبرێو لەپێهەڵخلیسکان دەپیارێزێ، هەروەها دەڵێن: منداڵی کەمدەبێت بەڵام ژین و بژێوی باشدەبێ، هەروەها دەڵێن: خوێندنەوەی بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونەوەی چارەنووس و ئەجەلی.

*دەگێرنەوە هەندێك لەپیاوچاكان سوورەتی (الاخلاص)ی بینی لەنێوان هەردووچاویدا نووسراوە، ئەم خەوەی بۆ (سەعید)ی كوڕی (موسەیب) گێڕایەوەو ئەویش وتی: ئەگەر خەوێكی ئاوات دیبێ مەرگت نزیكە،، پاشان ئەم لێكدانەوەیە بەم چەشنەی خۆیبوو.

*ئەگەر سوورەتی (الفلق)ی خوێندەوە شەڕی مرۆڤو جنۆكەی لێدووردەخرێتەوە لەگەڵ شەڕو خراپەی گیاندارو زیندەوەرانی زیانبەخش.

*ئەگەر سوورەتی(الناس)یخوێندەوە لەبەلاو نەهامەتی پارێزراو دەبێتو لەشەیتانو سەربازو وەسوەسەكانی دەپارێزرێ.

*(ئەبوسەعد) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: بۆ لێكدانەوەی ئەم خەوە دەبێت راڤەكاری خەو ئەو ئایەتەی خەوبینەر خوێندوویەتی بەهەندبگرێ، ئەگەر ئەو ئایەتەی بینی یا خوێندیەوە ئایەتی سۆزو بەزەیبوو مژدەو نازو نیعمەتو دڵنیایی لەخۆگرتبوو یان وریایی‌و گوناهو تاوانو ئاماژەی جۆری سزای تێدابوو دەبێت رەچاوبكرێ.

*ئەگەر بەشێوەیەكی دیار بینی قورئان دەخوێنێ ئەمانەت دەپارێزیو فەرمان بەچاكەو رێگری لەخراپە دەكات بەپێی ئایەتی: ﴿ يَتْلُونَ آيَاتِ اللهِ ﴾ هەتا ﴿...وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ ﴾ (آل عمران : ١١٤).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الفاتحة)ی خوێندەوە ، خوداوەند دەروازەكانی خێری لێئاوەلا دەكات، هەریەك لە(نافع)و(ئیبن كثیر)و (جەعفەری صادق)و (سەعیدی كوڕی مسیب)(رەزای خوایان لێبێت)دەڵێت: ئەگەر بینی سوورەتی (فاتحة)یا چەند ئایەتێكی لێدەخوێنێتەوە دوعایەكدەكاتو وەلامدەدرێتەوە.

هەروەها (كسائی)ش وێڕای واگوتنی دەڵێت: سوودێك دەبینێ پێی شادماندەبێت.

*(عومەر)ی كوڕی (خەتتاب) ـرەزای خوای لێبێت ـ دەڵێت: "ئەوەی لەخەودا بیخوێنێ لەئاینەكەیدا پارێزراو دەبێت مەگەر نەخۆشبێتو ئەجەلی نزیكبووبێتەوە".

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی سوورەتی (فاتحە) بخوێنێتەوە لەخەودا یان چەن ئایەت یا بەشێكی یاخود بەسەریا بخوێنرێتەوە خوداوەند دەرگاكانی شەڕی لێدادەخاتو دەروازەكانی خێری بۆ ئاوەلادەبێت.

*هەروەها دەڵێن: خوێندنەوەی سوورەتی (فاتحه) لەخەودا (حەج)ە.

*ئەگەر بینی سوورەتی (البقرة)ی خوێندەوە یان چەن ئایەتێك یاخود خوێنرایەوە بەسەریا (نافع)و (ئیبن کثیر)دەڵێن: زانیارییەکی فراوانو چاکێتی لەئاینو قوتاربوونی کوڕەکەیەتی (کسائی)ش هەمان رای هەیە.

*خاتوو (عائشه) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ئەوەی بیخوێنێت لەشوێنێکەوە دەچێت بۆ شوێنیکیترو بەختی لەوجێیەدا دەبێت کەبۆیدەچێت.

*(ئیبن فضالة) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا خوێندیەوە ئەگەر دادوەربێت وادەو کاتی نزیکدەبێتەوە، ئەگەر زانابوو تەمەنیدرێژ دەبێتو حاڵوباری باشدەبێت.

*هەندێك لەزانایان دەڵێن: ئەوەی سوورەتی (البقرة) بخوێنێت ئاینپەروەردەبێتو بەخێرایی دەچێت روو بەهەموو پاداشتێكو تەمەنی درێژدەبێتو شەڕو خراپەی کەمدەبێتو لەسەر نارەحەتیەکان ئارامدەگرێ.

*ئەگەر بەتەنیا (آية الكرسي) لێخوێند بەڵگەیە لەسەر زیرەکیو پارێزراوی.

*خوێندنی سوورەتی (البقرة) میراتیەکە ناکۆکی تیا دروستدەبێت.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(آل عمران) بخوێنێتەوە یان چەن ئایەتێکی بەسەرا بخوێنرێتەوە (ئەبوبەکر)ی (سدیق) (رەزای خوای لێبیت) لەگەڵ (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: کەمبەخت دەبێت لەنێوکەسەوکارو خانەوادەکەیداو لەگەورەییدا کورێکی پێدەبەخشرێو زۆر سەفەردەکات.

*دەڵێن: دەبێت بەدەمڕاست لەنێو خەڵکیداو پاكو بێگەرد دەبێت لەهەموو پیسیەك یاخود رزقو رۆزیو فەڕوپیتی دەستگیردەبێت.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (النساء) ی خوێندەوە یان چەن ئایەتێك یاخود بەسەریا خوێندرایەوە بەژنێك تاقیدەکرێتەوە هاوەڵایەتی ناقۆڵاو خراپدەبێت ، ئەگەر خوێندکاری زانیارییوو شارەزا دەبێت لەزانیاری فەرزەکاندا .

*(جەعفەری صادق) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ئەوەی بیخوێنێتەوە لەکۆتایی تەمەنیدا هاوەڵایەتی ژنێکی خراپدەکات.

*(ئیبن فضالة) دەڵێت: داواکاریو پێداویستی زۆردەبێتو هێزی زوبانیشی پتەودەبێت ، هەریەك لە (کسائی)و (عەلی) و(حەمزە) (رەزای خوایان بێت) هەروا دەڵێن.

*هەروەها دەڵێن: خاوەن گورپوتین دەبێت لەهاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی باشداو هاوەڵدار دەبێت.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (المائدة) ی خوێندەوە یان بەشێکی لێخوێندەوە یا بەسەریا خوێندرایەوە .

*(نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: نەفس بەخشندیەو حەزدەکات خواردن دەرخواردی خەڵکیبدات.

*هەروەها دەڵێن: دڵنیاییو خواناسیو ملکەچی لەگەڵ دەستەلاتی بەسەر خەڵکی شارێکدا پێدەبەخشرێ، یان خوداوەند دوعاونزای وەلامدەداتەوەو پشكو بەشی خۆی دەستگیر دەبێتو پاداشتی دەستگیردەبێتو بەتێکەڵبوونی لەگەڵ کۆمەڵێکی وشکدا تاقیدەکرێتەوە، هەروەها دەڵێن: فەرو بەرەکەتو رزقو رۆزی پێدەبەخشرێ.

*ئەگەر سوورەتی (الانعام)ی خوێندەوە لەخەودا یان بەشێك لەو سوورەتە یاخود خوێندرایەوە بەسەریا خاتوو (عائشە)و (کسائی)و (ئیبن فضالة)(رەزای خوایان لێبێت)دەڵێن: مژدەی پاراستنی ماڵو منداڵو رزقو رۆزی باشی لەدنیاو قیامەتدا پێدەبەخشرێ.

*هەروەها دەڵێن: خوداوەند کاروباری دنیاو قیامەتی بۆ کۆدەکاتەوەو بەزەییو رزقو رۆزی پێدەداتو سلاّوتدەدات لەدیاریو حەفتا هەزار فریشتە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن.

*ئەگەر سوورەتی (الاعراف)ی خوێندەوە لەخەودا یان چەن ئایەتێك یاخود خوێندرایەوە بەسەریا (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: لەهەموو زانیارییەك بەشی دەدرێو بەغەریبی دەمرێو باوەڕدارێکی دان پیانەردەبێت بەئایندا.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر خوێندیەوە سەفەر دەکات، پاشان بەخێرایی دەگەڕێتەوەو پارێزراو دەبێت لەشەیتانو فروفێڵەکانیو (ئادەم) دەبێت بەتکاکاری لەرۆژی قیامەتدا.

*هەروەها دەڵێن: خوێندنی سوورەتی (الاعراف) گاڵتەو لێخۆشبوونە بەشکستی دوژمنو بینینی لەخراپترین حاڵوباردا.

*ئەگەر سوورەتی (الانفال)ی خوێندەوە لەخەودا یا بەشێکی یاخود بەسەریا خوێندرایەوە (ئیبن عباس)

(ڕەزای خـوای لێبێـت) دەڵێـت: ڕوو لەمـەزنیو شـۆکداریدەکاتو بەدەستی دەهێنێت، بەهەمان شێوە (جەعفـەری صـادق)(ڕەزای خـوای لێبێـت) دەڵێـت زیادلەوە دەڵـێ: لەئاینەکەیدا پـارێزراو دەبێت.

*(ئـیبن فــضالة)دەڵێــت: ئەگــەر ســەرکردەو پادشــابوو ســەرکەوتوو دەبێــت ، ئەگــەر زانــابوو خوانــاسو دیندار دەبێت.

*هەروەها دەڵێن:ماڵوداراییو سامانی حــــەلاڵی پێدەبەخــــشرێ وەك دەسـکەوتێكو پێغەمبـەر (ﷺ) دەبێـت بەتکاکاری لەڕۆژی قیامەتدا.

*ئەگەر سـوورەتی (التوبـة)ی لەخـەودا خوێنــــدەوە یابەشــــێکی یــــاخود خوێندرایـەوە بەسـەریا (نـافع)و (ئـیبن کثیر) دەڵێت: پیاوچاکانی خۆشدەوێت.

*هەروەها دەڵێن: خوداوەند ئاینەکـەی چـاکدەکات پێغەمبـەر (ﷺ) لـەڕۆژی دواییـدا دەبێـت بەگەواهیـدەر بـۆیو لـەدووڕوویی پارێزراودەبێـتو ئـەجرو پاداشتی بەئەنـدازەی ژمـارەی دووڕوان پێــدەدرێتو پــەروەردگار دڵــسۆزی پێدەبەخشێ.

*ئەگەر لەخـەودا سـوورەتی (یـونس)ی خوێنــدەوە یــاخود بەشــێك یــا بۆیخوێندرایــەوە(ابــوبکر)ی(ســدیق) (ڕەزای خــوای لێبێــت)دەفــەرموێت: بەشێك لـە مـاڵو دارایـی شکـست ڕووی تێدەکات.

*(جەعفــەری صــادق)(ڕەزای خــوای لێبێت) دەڵێت: حەز لەتەنیایی دەکاتو بەنزیکی ژن پەستدەبێت.

*هــەروەها دەڵــێن: زانیــاریو دڵنیــایی پێدەبەخــشرێو ئەگــەر نەخۆشــێك خوێندیـــــەوە خوداوەنـــــد شـــــیفاو چارەسەریدەدات، یان لەدنیانەویستیدا ڕۆدەچێت.

*ئەگەر سوورەتی (هـود)ی خوێنـدەوە لەخـەودا یـا بەشـێکی لێخوێنـد یـاخود خوێندرایەوە بەسەریا (عومەر)ی کوڕی (خــەتتاب) (ڕەزای خــوای لێبێــت) دەفــەرموێت: دوژمنــی زۆر دەبێــت، (جەعفــەری صــادق)(ڕەزای خــوای لێبێـت) دەڵێـت: غـەریبی پێخۆشـترەو تەمەندرێژ دەبێت.

*هەروەها دەڵێن: ڕزقو ڕۆزی دەدرێت لەکشتوکاڵو دڵنیاییو گومانی باشبردن بەخوداو پاداشتی بەئەندازەی ئەوانـەی بڕوایان بە(نوح)(سەلامی خوای لێبێـت) هێنـا - لەگـەڵ ئەوانـەی بێـاوەڕبوون پێـدەدرێو لـەڕۆژی قیامەتـدا لەوانـە دەبێت شەفاعەتدەکەن.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر خوێندیەوە سەفەردەکات و ڕێنومایی و دنیا بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر سوورەتی (یوسف) بخوێنێتەوە یان بەشێکی یاخود بەسەریا بخوێنرێت (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: دوژمنی زۆردەبێت لەخانەوادەی خۆی و لەغەریبیدا رزق و ڕۆزی دەدرێت و ماڵ و سامان و بەختی دەبێت.

*هەروەها دەڵێن: سەرکردایەتی و ماڵی دەستگیر دەبێت و خوداوەند ئێش و ئازاری سەرەمەرگی لەسەر کەمدەکاتەوە، وتراویشە: مژدەی خێری پێدەدەن و دوای هەژاری دەوڵەمەند دەبێت و مەزن و شکۆمەند دەبێت دوای ڕسوایی و ملکەچی و دەرووی خێری لێدەکرێتەوە.

*ئەگەر سوورەتی (الرعد)ی خوێند لەخەودا یان بەشێکی لێخوێند یاخود خوێندرایەوە بەسەریا (ئەبوبەکر)ی (صدیق)و (جەعفەری صادق)(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێن: مەرگو لەدنیا دەرچوونی نزیکبوەتەوە.

*هەروەها دەڵێن: دڵنیادەبێت لەدەستەلاتدارو زۆر دەپارێتەوە لەخوداوەندو بەئەندازەی هەموو هەورێك پاداشتدەدرێتەوە لەدنیاو قیامەتداو لەوانە دەبێت کەپەیمانی خودا بەجێدەگەیەنن.

*ئەگەر سوورەتی (ئیبراهیم)ی خوێندەوە لەخەودا یا بەشێکی لێخوێندەوە یاخود خوێندرایەوە بەسەریا (جەعفەری صادق) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: لە(جابر)ی کوڕی (عەبدوڵلا) یان پرسیوە سەبارەت بەوەی دەیخوێنێتەوە لەوەلامدا وتویەتی: گوێملێبوو (عائشە)(ڕەزای خوای لێبێت) وتویەتی: لەیادکارەخواناسەکانە، هەروەها وتراوە: هۆکارێکدەبێت بۆ ڕەواندنەوەی غەم و پەژارەکانی و خوداوەند دەیپارێزێ.

*ئەگەر سوورەتی (الحجر)ی خوێندەوە یاچەن ئایەتێکی لێخوێندەوە یان بەسەریا خوێندرایەوە (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: بەهەژاری دەمرێت.

*(ئیبن فضالة) دەڵێت: ئەگەر دادوەربێت مەرگو وادەی لەدنیا دەرچوونی نزیکدەبێتەوە، ئەگەر پادشابێت ژیاننامەی باشدەبێ، ئەگەر بازرگان بێت دەیرێژێت بەسەر خانەوادەکەیداو وتراویشە خوداوەند رزق و ڕۆزییەکی باشیدەدات و

بەئەندازەی کۆچبەرو پشتیوانەکان پاداشتی دەبێت.

*هەروەها دەڵێن: خوێندنی ئەو سوورەتە مەردوم دەگرێتەوە لەسەرپێچی، ئەگەر زانایەك خوێندیەوە بەغەریبی دەمرێت.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (النحل)ی خوێند یان چەن ئایەتێکی لێخوێند یان بەسەریا خوێندرایەوە، (عومەر)ی کوڕی (خەتتاب) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: رزق و ڕۆزی پارێزراو دەبێت.

*(جەعفەری صادق) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: دەبێت بەخۆشەویستانی پێغەمبەر(ﷺ).

*هەروەها دەڵێن: لەشساغ دەبێت و رزق و ڕۆزی دەدرێت بەحەلاڵی.

*هەروەها دەڵێن: خوداوەند خۆشەویستی زاناو پیاوچاکانی پێدەبەخشێ و لێناپرسێتەوە لەسەر ئەوەی کەلەدنیادا پێی بەخشیوە.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الإسراء) ی خوێند یا چەن ئایەتو بەشێك یاخود خوێندرایەوە بەسەریا (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: گومان لەدەوریدروستدەکرێ لەلایەن دەستەلاتدارەوە یاخود لەلایەن گەل و کۆمەڵێکی سووك و نزمەوە، یان لەتوهمەتێك دەترسێ لەکاتێکدا بێتاوان و پاکەو ستەملێکراو دەبێت و کوڕێکی دەبێت پاشان حاڵ‌وباری پشت بەخودا باش و چاکدەبێ.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(الکهف)ی خوێندەوە یان بەشێك یاخود خوێندرایەوە بەسەریا (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: تەمەندرێژو حاڵ‌و گوزەرانباشدەبێ و بەختێکی چاکیدەبێت لەژیاندا.

*هەندێکدەڵێن: ئەوەندە دەژی هەتا لەژیان بێزار دەبێ و سەرجەم تایبەتمەندیەکانی ئاین دەپارێزێ و ماڵ سامانی زۆردەبێ و دەگات بە هیواو ئاواتەکانی.

*هەروەها دەڵێن: ترس و بیم ڕووی تێدەکات لەدوژمنێکی خۆبەزلزان و دواتر دڵنیایی دێت بەسەریاو لەدوژمنی شەرەنگێز پارێزراودەبێت.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (مریم)ی خوێندەوە یاچەند ئایەتێك یاخود خوێندرایەوە بەسەریا خاتوو (عائشە)و (جەعفەری صادق) (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێن: خوداوەند دەرووی لێدەکاتەوە.

*هەروەها دەڵێن: لەگەڵ پێغەمبەراندا دەبێت ، ئەوانەی خوای گەورە

لەرشتەی پێغەمبەردا(ﷺ) باسیکردوون.

*هەروەها دەڵێن: خوداوەند خۆشەویستی پیاوچاکانی پێداون‌و ماڵ‌و دارایی بەهێزی دەستدەکەوێ، هەروەها دەڵێن: ڕێ وندەکات پاشان ڕێنموویی دەکرێتەوە.

*ئەوەی سوورەتی (طه)بخوێنێتەوە یا چەند ئایەتێك یاخود بۆی بخوێنرێتەوە (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: دژایەتی جادووگەراندەکات‌و خوداوەند جادوو لەسەردەستی ئەودا بەتاڵدەکاتەوە.

*هەروەها دەڵێن: حەز لەشەونوێژدەکات لەگەڵ چاکەدا، یاخود بێئاگایی‌و سەرقاڵی رووی تێدەکات سەبارەت بەئاینەکەی ، پاشان دەگەڕێتەوەو پاشگەزدەبێتەوە.

*ئەگەر لەسەفەردابوو یاخود دوورکەوتبوەوە لەکەس‌وکارەکەی دەگەڕێتەوە لایان‌و لەسەر دەستی ئەو هەندێك لەدڕندەو شەڕانییەکان دەستیگردەکرێن‌و خوداوەند سەرکەوتن‌و زاڵبوونی پێدەبەخشێ بەسەر دوژمنانداو لێپرسینەوەیەکی هێواش‌و سووکی لەگەڵ ئەنجامدەدات‌و فریشتەکان تەوقەو نوێژی لەسەر دەکەن.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الانبیاء)ی خوێندەوە یا چەند ئایەتێکی لێخوێندەوە یاخود بۆی خوێندرایەوە (جەعفەری صادق)(رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: خوداوەند پشکی مەزن‌و گەورەی پێدەدات.

*هەروەها دەڵێن: زانست‌و زانیاری پێغەمبەرانی پێدەدرێ لەگەڵ پاڕانەوە.

*نوێژو دوعای پێغەمبەران (سڵاوی خوایان لێبێت) بەدەستدەهێنێت‌و سەردەکەوێت بەسەر دوژمناندا.

*خوداوەند ئیمامەت‌و رووکردنە گوێڕایەڵیەکانی پێدەبەخشێ.

*ئەگەر سوورەتی (الحج)ی خوێندەوە یا چەن ئایەتێکی یاخود بۆیخوێندرایەوە (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: چەند جارێك (حەج)دەکات.

*(ئیبن فضالة) دەڵێت: مەگەر نەخۆش بێت ئەوکات دەمرێت.

*فەرزی (حەج) بەجێدەگەیەنیٚ‌و پاشان ناگەڕێتەوە.

*ئەگەر سوورەتی (المؤمنون)ی خوێندەوە یا چەن ئایەتێکی لێخوێندەوە یاخود بۆیخوێندرایەوە حاڵ‌وبارێك دەبینیٚ خەڵکی پێی سەرسام دەبن.

*هەروەها دەڵێن: (حەج) دەكاتو لەگەڵ پلەوپایەبەرەكاندا لەباوەڕداراندەبێت.

*ڕوونـاكیو سەرفرازیو باوەڕی ڕاستەقینەو ڕاستگۆیی بەدەستدەهێنێت.

*پاكێتی بەدەستدەهێنێتو لەبەلاو نەهامەتی قوتار دەبێت.

*خوداوەند لەدنیادا بەلگەی پێدەبەخشیو لەگەڵ باوەڕداراندا حەشر دەكریو فریشتەكان مژدەی چاكەی پێدەدەنو لەكاتی سەرەمەرگدا دڵخۆشیدەكەن.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (النور) بخوێنێتەوە یا چەن ئایەتێك یاخود بۆیبخوێنرێتەوە (جەعفەری صادق)(رەزای خوای لێبێت)دەڵێت: لەوانە دەبێت كەفەرمانبەچاكەو ڕێگری لەخراپەدەكەنو لەسەر خوا خەشمو قینو خۆشەویستی ئەنجامدەدەن.

*هەروەها دەڵێن: نەخۆشدەكەوێ یاخواناسیو دڵنیایی پێدەبەخشرێ.

*ئەگەر دە ئایەتی لێخوێندەوە ژنەكەی تەلاقدەدات یان خۆیدەمرێ.

*ئەگەر سەرەتای سوورەتەكەی خوێندەوە دوای سوونەت دەكەویو بەئەندازەی هەر باوەڕدارێكی نێرومێی

پێشینو داهاتوو ئەجرو پاداشتی دەستگیردەبێ.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الفرقان)ی خوێندەوە یا چەن ئایەتێكی لێخوێندەوە یاخود بۆیان خوێندەوە (نافع)و (ئیبن كثیر) دەڵێن: لەوانەدەبێ حەقیان خۆشدەویو ڕقیان لەناحەقە.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الشعراء)ی خوێندەوە یا چەند ئایەتێكی لێخوێندەوە یاخود بۆیخوێندرایەوە (ئەبوبەكری صدیق)و (جەعفەری صادق) (رەزای خوایان لێبێت) دەڵێن: لەرزقو ڕۆزیدا گرفتو ناڕەحەتی تووشدەبیو هەرچییەك بەدەستدەهێنێ دوای ماندووونێكی زۆردەبێ.

*هەندێكیان دەڵێن: خوای گەورە لەبوختانو هەڵبەستی ناحەقو قسەو وتەی پووچو نابەجێ دەیپارێزێ.

*پارێزراودەبێت لەقسەی بێماناو درۆو خۆنواندن بەجۆرێكی ناشیاو.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی( النمل)ی خوێندەوە یا چەن ئایەتێكی لێخوێند یاخود خوێندرایەوە بەسەریا (نافع)و (ئیبن كثیر) دەڵێن: دەبێت بەسەردارو گەورەی نەتەوەی خۆی.

*(ئـيبن فـضالة) ش دەڵێـت: زانياريدەبێت.

*هەروەها دەڵێن: موڵكو دەستەلاَتو تێگەیـشتنو پلەوپایـەی پێـدەدرێ دوعـای گیرادەبـێو بەئەنـدازەی راسـتگۆیی (سـلێمان)و پێغەمبـەران (سـەلامی خوایـان لێبێـت) پاداشـتدەدرێتەوەو کـاتێ لەگۆڕەکـەی دێتەدەرەوە دەڵێ:﴿لا إله الاّ الله﴾.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الضحی)ی خوێنـد یـا چـەند ئایـەتێکی لێخوێنـد یـاخود بۆیخوێندرایـەوە (ئەبوبـەکری صدیق) (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێت: لەسـەر زەوی خوداوەنـد بـەڕووداوێك تاقیدەکاتەوە.

*هەندێك لـەزانایان دەڵێن : خوداوەنـد دانـاییو خێـری لەخوێندنـەوەی (تـەورات)و (ئینجیـل) پێـدەداتو زانستو تێگەیشتنی پێدەبەخشرێ.

*ئەگـەر لەخـەودا سـوورەتی (العنکبـوت)ی خوێنـد یـان چـەند ئایـەتێکی لێخوێنـدەوە یـاخود بـۆی خوێندرایـەوە (جەعفـەری صـادق) (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەڵێـت: خوداوەنـد تاقیدەکاتـەوەو مـژدەی دەداتێ بەزیادەی خێروچاکە.

*هـەروەها دەڵـێن: خوداوەنـد کـەمو کوڕییەکانی دادەپۆشـێو قوتاریدەکات لـەدوژمنانو بەئەنـدازەی بـاوەڕدارانی پیاوو ژن پاداشتیدەداتەوە.

*ئەگـەر لەخـەودا سـوورەتی (الـروم)ی خوێنـدەوە یـا چـەن ئایـەتێکی خوێنـد یـاخود بۆیخوێندرایـەوە (نـافع)و (ئـيبن کثیر)دەڵێن:دووڕوویی ڕوو لەدڵیدەکات.

*(ئيبن فضالة) دەڵێت: ئەگـەر زانـا یـا دادوەربوو پارێزو ستەمکاردەبێ، ئەگەر بازرگـانبوو سـوودێکی گـەورەی دەسـتگیر دەبێـت یـا مـاڵو منـداڵی پێدەدرێ.

*کاروبـارێکی بـۆ بەجێـدێت دژایـەتیو نـاکۆکی لـەنێوان خـۆیو کەسـێکیتردا بەرپادەکرێو پاشان زاڵدەبێت بەسەریا ئەگـەر بـاوەڕداران لەجەنگـدابوون سەرکەوتوودەبن بەسەر دوژمناندا.

*ئەگـەر لەخـەودا سـوورەتی(لقمـان)ی خوێنـدەوە یـا بەشـێکی لێخوێنـدەوە یـاخود بۆیخوێندرایـەوە ، خوداوەنـد فێری قورئانو داناییدەکاتو دڵنیـایی پاكو پوختی پێدەبەخشرێ.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(السجدة) ی خوێنـدەوە یـا چـەن ئایـەتێکی لێخوێنـدەوە یـاخود بۆیخوێندرایـەوە (جەعفـەری صـادق) (ڕەزای خـوای

لێبێـت) دەڵێـت: یەکتاپەرسـتی بـەهێز دەبێتو نەفسی پاکو پارێزراودەبێ.

*هەروەها دەڵێن: لەدنیا ژینی خۆشو خواناسـیو پارێزکـاری پێدەبەخـشرێو پاداشتی بەئەنـدازەی کەسـێکە شـەوی (قــدر)ی زیندوکردبێتـــەوەو نزیکـــی لەپەروەردگارەوە بەدەستدەهێنێ.

*هـــەروەها دەڵـێن: ئەوکەســـە حـــەز لەشەونوێژدەکات.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الاحزاب)ی خوێنـدەوە یـا بەشـێکی لێخوێنـدەوە یـاخود بۆیـان خوێنـدەوە (ئەبوبـەکری صدیق) (رەزای خوای لێبێـت) دەڵێـت: ئیرەیی بەخانەوادەی خۆیدەبات.

*هـەروەها دەڵـێن: کەسـێکی حەقبێـژ دەبـــێو پـــشت لەناحـــەق دەکـــاتو پیاوچاکانی خۆشدەوێو لەسزای گۆڕ دڵنیادەکرێ، یـان پـشتگیرو پـشتیوانی دەبێـت لەلایەکـەوە خـۆی نـەیزانێو بێئاگابێت لێی.

*ئەگـەر لەخـەودا سـوورەتی (سـبأ)ی خوێند یا چـەن ئایـەتێکی لێخوێنـدەوە دەگونجێـــت نـــازو نیعمـــەتێکی لێوەربگرێتـەوە پاشـان پێـی بداتـەوە. هـەروەها وتـراوە: ئـازا دەبـێو حـەزی لەهەڵگرتنی چەکدەبێ.

*ئەگـەر لەخـەودا سـوورەتی(فـاطر)ی خوێنــدەوە یــا بەشـێکی لێخوێنــدەوە یـاخود خوێندیانـەوە بەسـەریا فریشتە نزیکـــەکان داوای لێخۆشـــبوونی بـــۆ دەکەنو پەروەردگار لێی رازیدەبێت.

*هـــەروەها دەڵـێن دوعـای گیرادەبـێو لـــەرۆژی قیامەتیـــشدا لەهەشـــت دەرگاکـەی بەهەشـتەوە بانگـدەکرێو لەهەریەکێکیان بیەوێت لەوێوە دەچێتە نێوی.

*هـــەروەها دەڵـــێن: ســـەرکەوتنو زاڵبوونی بەسەر دوژمناندا بـۆ فەراهـەم دێت.

*ئەگـەر لەخـەودا سـوورەتی (یـس)ی خوێنـد یا چـەن ئایـەتێك یـاخود بـۆی خوێندرایەوە خوداوەند لـەژێر کۆمـەڵو نەتـەوەی (محمـد) (ﷺ)و خانـەوادەیا حەشریدەکات.

*هـــــەروەها دەڵـــــێن: یـــــەکێك لەخۆشیەکانی دنیای دەستگیردەبێت، یـــاخود لەپاکانــدەبێو ئاینەکـــەی رووپامـــایی تێـــدا نییـــەو پاداشـــتی بەئەنـــدازەی یـــەکێك کـــەدوانزەجار قورئـانی خوێنـدبێ دەدرێتـەوە چـونکە سوورەتی (یس) دڵی قورئانە.

*ئەگـــــەر لەخـــــەودا ســـــوورەتی (الصافات)ی خوێندەوە:

+فێری پیشەیەکدەبێ پێی سەرسام دەبن.
+شەیتانە یاخیبوەکانی لێدوور دەکەوێتەوە.
+بژێوییەکی حەلاڵو دوو کوڕی پێدەبەخشرێ.
+خێری دنیای دەستگیر دەبێ لەگەڵ پاکیو بەدووریی لەپیسیو ترسان لەپەروەردگار.
*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(الزمر)ی خوێند یان چەن ئایەتێکی لێخوێند یاخود بۆیخوێندرایەوە کتێبێکی زۆر بەدەستدەهێنێتو تێدەگات لەوەی تێدایەو خۆی پێدەپارێزێ.
*هەروەها دەڵێن: لەڕۆژی قیامەتدا یەکەم ریز دەبێ لەگەڵ باوەڕداراندا و پاداشتی ترسانی لەپەروەردگار وەردەگرێ ، هەروەها دەڵێن: زۆر دەژی هەتا کوڕی کوڕەکەی دەبینێ.
*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (غافر)ی خوێند یا چەن ئایەتێکی لێخوێندەوە یاخود بۆیخوێندرایەوە باوەڕدارێکی راستەقینە دەبێتو خوداوەند لێی خۆشدەبێو چاوپۆشی لێدەکات.
*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(فصلت)ی خوێندەوە یا چەن ئایەتێکی لێخوێندەوە خەڵکی بانگدەکات بۆ رێنوماییو نیگای راست بەئەندازەی پیتەکانی خێری دەستگیردەبێت.
*هەروەها دەڵێن: کارێکی پاکو پوخت ئەنجامدەدات لەپێناوی پەروەردگارا بەنهێنیو ئاشکرا.
*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(الشوری)ی خوێندەوە فریشتەکان سلاوات دەدەن لەدیاریو داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن.
*هەروەها دەڵێن: زانیاریو کرداری زیادی پێدەدرێو، لەنەخۆشی بەدەردەکەوێتو چاکدەبێتەوە.
*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الزخرف)ی خوێندەوە یا بەشێکی لێخوێندەوە یا بۆیخوێندرایەوە رزقێکی کەمی پێدەدرێو لاوازوکەم توانا دەبێت لەدنیادا.
*هەروەها دەڵێن: راستگۆ دەبێتو بەشی لەدنیادا کەمدەبێو لەقیامەتیشدا خۆشحاڵدەبێو لەوانەدەبێ کەلەقیامەتدا پێی دەوترێ: "ئەی بەندەکانم مەترسنو غەمو پەژارە مەخۆن".
*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(الدخان)ی خوێندەوە یان بەشێکی لێخوێندەوە یاخود بۆیخوێندرایەوە لەدوژمنانی قوتار دەبێتو پلەوپایەی بەرزو بالا بەدەستدەهێنێت.

*هـەروەها دەڵـێن: داواخـوازی شـتی نایابو بەنرخە.
*هــەروەها دەڵــێن: دڵنیــا دەبێــت لەچـەكمەی سـتەمكارو سـزای گـۆڕو ئاگرو دڵنیایی پتەو دەبێت.
*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الجاثیة)ی خوێنـدەوە یـان بەشـێكی لێخوێنـدەوە یـاخود بۆیخوێندرایـەوە خواناسـیو دینـداری بەدەسـتدەهێنێت. هـەروەها دەڵــێن: لەخوداوەنــد دەترســێو خوازیاری قوتاربوونە لەخراپە.
*هەروەها خوداوەند كەمو كوڕییەكانی دەشــارێتەوەو لــەرۆژی قیامەتــدا بەدڵنیاییەوە حەشریدەكات.
*ئەگــەر ســوورەتی (الاحقــاف)ی خوێنـدەوە یـان بەشـێكی لێخوێنـدەوە یـاخود بۆیخوێندرایـەوە بـیر لەمـەزنی پەروەردگارو دەستەڵاتیدەكاتەوە.
*هـەروەها دەڵـێن: خـراپ دەبێـت بـۆ دایــكو بــاوكی پاشــان تەوبەیــەكی باشــدەكاتو هەڵوێــستی باشــدەبێ لەگەڵیان.
*(جەعفــەری صــادق) (رەزای خــوای لێبێــت)دەڵێــت:ئەگــەر ســوورەتی (الاحقــاف)ی خوێنــدەوە فریــشتەی گیانكێشان لـەجوانترین شـێوەدا دێـت بـۆلایو نـەرمو نیانـدەبێت لەگـەڵی،

هەروەها وتویانـە: غـەمو پـەژارە رووی تێــدەكات لەلایەكــەوە خوازیــاری خێروچاكەیە.
*ئەگەر لەخـەودا سـوورەتی (محمد)ی (ﷺ) خوێنــــدەوە یـــا بەشــــێكی لێخوێنـدەوە یـاخود بۆیخوێندرایـەوە دەچـێتە ژێـر بەیـداخی ئـەو لـەرۆژی قیامەتداو لەدنیادا لەسەر سوننەتی ئەو دەبـێ، هــەروەها دەڵـێن: سـەركەوتوو دەبێـت بەسـەر دوژمنانـداو بـەرزیو بڵنــــدیو ناوبــــانگی بــــاش بەدەستدەهێنێت.
*ئەگـەر لەخـەودا سـوورەتی (الفـتح)ی خوێنـدەوە یـان بەشـێكی لێخوێنـدەوە یاخود بۆیان خوێندەوە برایانو خـزمو دۆستان بەسەر دەكاتەوە.
*هـەروەها دەڵـێن: جیهـادو تێكۆشـان لەپێناوی خوادا بەدەستدەهێنێت.
*هەروەها دەڵێن: پـشكو بەشـی دنیـاو قیامــەتی بۆیــەكانگیر دەبێــت یــاخود دوعــای گیرادەبــێو لەتەنگەبــەری بەدەردەچــێو داواخــوازی خــۆی بــۆ بەدیدێت.
*هەروەها دەڵێن: دەروازەكـانی خێـری بۆ ئـاوەڵا دەبێـتو وەك ئـەوە دەبێـت پەیمانی بەپێغەمبەر(ﷺ) دابێت.

*ئەگەر سوورەتی (الحجرات)ی خوێندەوە لەخەودا یا بەشێکی لێخوێندەوە یاخود بۆیخوێندرایەوە شوێنکەوتنی فەرمانی خودای پێدەبەخشرێ لەقورئانداو خەڵکی تەبا دەکات.
*ئەگەر سوورەتی( ق )ی خوێندەوە یا بەشێکی لێخوێندەوە یان بۆیخوێندرایەوە کردارو رەفتارەکانی پێغەمبەرانی پێدەبەخشرێ(سەلامی خوایان لێبێت).
*هەروەها دەڵێن: زانیاری بەدەستدەهێنێت یا بەباوەڕەکەی سوێندەخوات یاخوداوەند دەروازەکانی خێری بۆ دەکاتەوەو ئێش‌و ئازارەکانی سەرەمەرگی لەسەر ئاساندەبێت.
*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(الذاریات)ی خوێندەوە یا بەشێکی لێخوێندەوە یاخود بۆیخوێندرایەوە رزق‌و رۆزی لەکشتوکاڵی زەوی دەستیگر دەبێ‌و لەگەڵ هاوڕێ‌و تێکەڵبووانی تەبا دەبێت‌و وتراویشە: هاوسەردەگرێ یاخود سوێند دەخوات.
*ئەگەر سوورەتی (الطور) ی خوێندەوە یان بەشێکی لێخوێندەوە یاخود بەسەریا خوێندرایەوە روو دەکاتە (کابە)ی پیرۆز.
*هەروەها دەڵێن: کوڕێکی دەبێت پاشان کوڕەکەی دەمرێ بەر لەباڵغبوونی.
*هەروەها دەڵێ: نزیکی لەپەروەردگارەوە پێدەبەخشرێ بەهۆی کارێکی باش یان هاوسەرگیرییەکی پیرۆزەوە.
*ئەگەر سوورەتی (النجم)ی خوێندەوە یاخود بەشێکی لێخوێندەوە یان بۆیخوێندرایەوە (جەعفەری صادق) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: کوڕێکی دەبێت لەپێناوی رەزامەندی خودایا دەمرێت‌و ئەگەر سەفەریکرد دەگەڕێتەوە.
*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (القمر)ی خوێندەوە یان بەشێکی لێخوێندەوە یاخود بۆ یخوێندرایەوە زیندانیدەکرێ‌و پاشان لەزیندان قوتاردەبێ‌و خوداوەند شەڕی خراپەکارانی لێدووردەخاتەوەو لەرۆژی قیامەتیشدا وەك مانگی چوار دەبێت.
*هەروەها دەڵێن: لەگومانداری دێتە دەرەوە چاکدەبێ دوای تێکچوونی ئاینەکەی.
*(جەعفەری صادق) (رەزای خوای لێێت) دەڵێت: دەترسێ نوقم ببێت‌و بخنکێ.

*(ئـيبن مـسيب) دەڵێـت: ترسـی یاخیبوونی هەیە.

(ئـيبن فـضالة) دەڵێـت: لـەدنیادا بەمۆڵەت قوتار دەبێت.

*ئەگـەر لەخـەودا بینـی سـوورەتی (الرحمن)ی خوێند یا بەشێکی لێخوێند یـاخود بۆیخوێندرایـەوە پـەروەردگار دەیگوێزێتـەوە بـۆ یـەکێك لـەو دوومزگەوتە مەزنە (مزگـەوتی مەککە) یا (مەدینـە) یـان بۆ (عـەدەن) یا بۆ (ئەسـکەندەریە) یـاخود یـەکێکیان دەمرێ.

*هـەروەها دەڵـێن: خوداوەنـد بەسۆزو بەزەیی خۆی رەحمی پێدەکات.

*هـەروەها دەڵـێن: قورئـان لەبـەردەکاتو پاشـان لەئاینـدا شـارەزا دەبێـتو زانیاریـەکی زۆری دەسـتگیر دەبێـت، ئەگـەر دوژمنـداربوو نـاتوانن شەڕی پێبگەیەنن وهەنـدێکیش دەڵـێن: لە(قودس) نیشتەجێدەبێ.

*ئەگـەر سـوورەتی( الواقعـة)ی خوێندەوە یان بەشێکی لێخوێندەوە یا بەسەریا خوێندرایەوە (عومەر)ی کوڕی (خـەتتاب) (رەزای خـوای لێبێـت) دەڵێـت: هـەرگیز لـەدنیادا هـەژار ناکەوێتو لەقیامەتیشدا رێ ونناکات.

*هـەروەها دەڵـێن: لەپێشەنگاندەبێت بۆ چوونە بەهەشت.

*هەروەها دەڵێن: دڵنیادەبێت لـەوەی لێـی دەترسـێو دنیـا باڵـەکانی بـۆ دەکاتەوە.

*ئەگـەر سـوورەتی( الحديـد)ی خوێندەوە یاخود بەشێکی لێخوێندەوە یان بەسەریا خوێندرایەوە (ئەبوبەکری صـدیق) (رەزای خـوای لێبێـت) لەگـەڵ (جەعفـەری صـادق)(رەزای خـوای لێبێـت) دەڵـێن: هێـزو توانـای لـەئاینی خودایا دەستدەکەوێ رەوشتبەرزو بـاڵا دەبێ.

*هـەروەها دەڵـێن: چـاکەو ستایـشی لەلایـەن خەڵکییـەوە دەسـتگیردەبێ لەگـەڵ لەشـساغی، یـان مـاڵو دارایـیو خێر ، هەروەها سـەرجەم دەروازەکـانی خێری لێدەکرێتەوەو لەریزی باوەڕداران بەخوداو پێغەمبەرەکەی دەنووسرێ.

*ئەگـەر سـوورەتی (المجادلـة) ی خوێنـدەوە یـان بەشـێکی لێخوێنـدەوە یـاخود بەسـەریا خوێندرایـەوە (نـافع)و (ئيبن کـثیر) دەڵێن: سـزاو ئەشـکەنجە دەدرێ لەکۆمەڵێکی نزمو سووك.

*(ئيبن فـضالة) دەڵـێ: ئەگـەر زانـابوو هیچ زیانێکی پێناگات.

*هەروەها دەڵێن: قوتاردەبێت لەوەی بەدوویدا دەگەڕێ بەنزایەکی قبوڵو وەرگیراو.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الحشر)ی خوێندەوە یا بەشێکی لێخوێندەوە یاخود بەسەریا خوێندرایەوە پەروەردگار لەگەڵ چاکەکاراندا حەشریدەکات.

*هەروەها دەڵێن: چاکدەبێت دوای تێکچوونی ئاینەکەیو لەغەمو پەژارە قوتاردەبێ، ئەگەر لەسەفەردابوو لەسەفەرەکەی دەگەڕێتەوە یان خوداوەند رزقو رۆزی دەداتو لەقیامەتدا بەدڵنیاییەوە حەشردەکرێ.

*(جەعفەری صادق) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: خوداوەند کاتێ حەشریدەکات لێی رازییە.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الممتحنة)ی خوێندەوە یان بەشێکی لێخوێندەوە یاخود خوێندیەوە بەسەریا (جەعفەری صادق) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: لەکۆتایی تەمەنیدا تەوبەیەکی باشدەکات، هەروەها دەڵێن: لەهەموو شەڕو خراپەیەك قوتار دەبێ یاخود دڵسۆزی دەنوێنێتو گوێڕایەڵی دەردەبڕێ.

*ئەگەر سوورەتی( الصف)ی خوێندەوە یان بەشێکی لێخوێندەوە یاخود خوێندرایەوە بەسەریا (جەعفەری صادق) (رەزای خوای لێبێت)دەڵێت: لەگەڵ کۆمەڵێکی بیدعەچیدا دەبێت، یان غەزادەکاتو لەپێناوی خودایا دەمرێت ، یاخود جێگیربوونو بەجێهێنانی نەزر بەدەستدەهێنێت یا زمانپارێز دەبێ.

*ئەگەر سوورەتی (الجمعة)ی خوێندەوە یا بەشێکی لێخوێندەوە یان بۆیخوێندرایەوە، خوداوەند بەختی لەدنیاو قیامەتدا یەکانگیردەکاتو بەئەندازەی ئامادەبوونی مەراسیمی (جومعە)و ئەوانەی ئامادەنەبوون پاداشتدەدرێتەوە.

*ئەگەر سوورەتی (المنافقين)ی خوێند یا چەند ئایەتێکی لێخوێند یان بۆیانخوێندەوە (جەعفەری صادق) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ژن بەسەر ژنەکەی دەهێنێت.

*هەروەها دەڵێن: دووڕوویی و گومانی لێدەردەکەوێت، یا کەسێکی ناپاکی قۆڵبڕ پێیدەگاتەوە یا لەگەڵ کۆمەڵێکدا تێکەڵدەبێو بەدوور دەبێت لەبۆچوونو بیروبۆچوونیان.

*ئەگەر سوورەتی (التغابن)ی خوێندەوە یا چەن ئایەتێکی لێخوێند یاخود بۆیخوێندرایەوە دڵنیادەبێت لەزیندوبوونەوە.

*هەروەها دەڵێن: مەرگی کتوپڕی لێدوور دەخرێتەوەو دڵنیادەبێت لەناڕەحەتیەکانی قیامەت.

*ئەگەر سوورەتی( الطلاق) ی خوێندەوە یا چەند ئایەتێکی لێخوێند یاخود بۆیانخوێندەوە (ئەبوبەکر)ی (صدیق) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: دەبێت بەشای راستگۆیان و (ئیبن فضالة) هەمان رای هەیەو ، هەروەها (جەعفەری صادق) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: دەبێت بەگەورەی ژنان یان ژن زۆر تەڵاقدەدات.

*هەروەها دەڵێن: لەنێوان خۆیو ژنەکەیدا ناکۆکی دەکەوێتەوەو بەپێی قورئانو سوننەت دەمرێ.

*هەروەها دەڵێن: ژنێکی دەبێت ئێشو ئازاریدەدات.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(التحریم)ی خوێند یا چەند ئایەتێکی لێخوێند یاخود بۆ یخوێندرایەوە (جەعفەری صادق)(ڕەزای خوای لێبێت) و (ئیبن فضالة) دەڵێن: بەژنێك تاقیدەکرێتەوە ئازاریدەدات لەرووی نەفسیو ماڵو سامانەوەو پاشان ژنەکە پەشیماندەبێتەوەو دوایی تەمەنی بەخێر کۆتایی دێتو خۆی لەحەرامەکان دەپارێزێو لێی نزیك نابێتەوە.

*هەروەها دەڵێن: دەکەوێت بەسەر قسەو وتەیەکدا دەربارەی ئەوکراوە، هەروەها دەڵێن: خوداوەند لێی خۆشدەبێ.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الملك)ی خوێند یان چەند ئایەتێکی خوێند یا بۆ یانخوێندەوە لەخزمەتی فەرمانڕەوایەکدا دەژی کەسوودو قازانجی پێگەیاندوە.

*(نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێت: لەفەرمانڕەواو دەستەڵاتدارەوە دەستکەوتی دەستدەکەوێ.

*هەروەها دەڵێن: دەبێت بەیەکتاپەرستو بیر لەدروستکراوەکانی خوداوەند دەکاتەوە.

*هەروەها دەڵێن: قوتاردەبێت لەسزای خوایی لەکاتی روحکێشانیو مژدەو خێرو فەڕی پێدەگات.

*ئەگەر سوورەتی( ن)ی خوێند یا چەن ئایەتێکی یاخود بۆیخوێندرایەوە تەماشای دروستکراوەسەیرو سەمەرەکانی پەروەردگار دەکاتو

پیاوێکی زاناو ژیر دەبێتو رەوشتی بەرزو بالآدەبێ.

*هەروەها دەڵێن: سەردەکەوێت بەسەر دوژمناندا ، دەگونجێت ماڵو سامانێکی دابێت بەهەژاران.

*ئەگەر سوورەتی (الحاقة) ی خوێند یا چەند ئایەتێکی لێخوێند یاخود خوێندرایەوە بەسەریا، ئەگەر لەسەر دوانگە وەستابوو لەسەر بیدعەیەك سزادەدرێ.

*(ئیبن مسیب) دەڵێت: ئەگەر بەدانیشتنەوە خوێندیەوە بەقامچی لێیدەدرێ.

*(جەعفەری صادق)(رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ئەگەر فەرمانڕەوایەك لەخەودا خوێندیەوە موڵكو دەستەڵاتەکەی تیادەچێت ، ئەگەر گەواهیدەرێك خوێندیەوە گەواهیدانەکەی دەوەستێ ، ئەگەر نەخۆشێك خوێندیەوە دەمرێت، ئەگەر ژنێك خوێندیەوە مێردەکەی تەلآقیدەدا، ئەگەر کەسانێك خوێندیان لەکاتێکدا دەدرانە پاڵ زانیاری بەقامچی لێیان دەدرێت، ئەگەر دانیشتبوو زیندانیدەکرێ، ئەگەر دەڕۆیی ترسی قاچو دەست بڕینیان هەیە.

*هەروەها دەڵێن: زۆر لەخوا نزیکدەبێتەوە یاخود دەکەوێتە بەلآو نەهامەتیو پاشان تەوبە دەکات.

*هەروەها دەڵێن: حەقو راستی لەسەر دەستی ئەودا دێتە دیو بۆماوەی (چل)ساڵ خێرو چاکە ئەنجامدەدات.

*ئەگەر سوورەتی (المعارج)ی خوێند یان چەن ئایەتێك یاخود بەسەریا خوێندرایەوە سەرەتای تەمەنی دوودڵدەبێو لەکۆتایشدا لەسەر خواناسیدەبێت.

*هەروەها دەڵێن: کەسانی نزیکی لێنزیکدەبنەوەو زۆر رۆژو دەگرێت.

*هەروەها دەڵێن: دوعای شەڕ لەخۆیو خانەوادەکەیدەکات.

*ئەگەر سوورەتی (نوح)ی خوێند یا چەن ئایەتێکی لێخوێند یاخود بۆیخوێندرایەوە (جەعفەری صادق) (رەزای خوای لێبێت)دەڵێت: بەکۆمەڵێکی گاڵتەباز تاقیدەکرێتەوە ، یا ئەو نوێنەری رەوانەیدەکات هێواش دەبێت.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(الجن)ی خوێند یا چەن ئایەتێکی لێخوێند یاخود بۆی خوێندرایەوە (جەعفەری

صادق) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: رزق و ڕۆزی و بـژێوی تەنگەبـەر دەبێـت پاشان خوداوەند دەرووی لێدەکاتەوەو جنۆکە ملکەچیدەبێت.

*هـەروەها دەڵـێن: لەگـەڵ کۆمـەڵێکی وشـکدا ڕەق و زبـر دەبێـت، هـەروەها دەڵـێن: تێگەیـشتن و حـاڵیبوونی بەسوودی پێدەبەخشرێ.

*ئەگەر سوورەتی (المزمل)ی خوێند یا چـەند ئایـەتێکی خوێنـدەوە یـاخود بۆیخوێندرایـەوە چـاکەکاردەبێ و شەونوێژ دەکات.

*هەروەها دەڵـێن: قورئـان دەخـوێنێ و تـەنگی و نارەحـەتی دنیـاو قیامـەتی لێدووردەخرێتەوە.

*هـەروەها دەڵـێن: تەنگـەژەو تـرس و بیمی تووشدەبێ ئەگەر لەسەر شەونوێژ بـەردەوامبوو، گەرسـاردبوەوە لێـی دەستپێبکاتەوە.

*ئەگەر سوورەتی (المدثر)ی خوێند یا چـەند ئایـەتێکی لێخوێنـد یـاخود بۆیخوێندرایـەوە بـەرۆژودەبێت بەدرێژایی ساڵ.

*هـەروەها دەڵـێن: ژینـی لێـڵ و ئـاڵۆزدەبێ و رزق و ڕۆزی ئەسـتەم و گرانـدەبێ، هـەروەها دەڵـێن: فـەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەدەکات.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (القیامـة)ی خوێند چەند ئایەتێکی لێخوێنـد یاخود بۆیخوێندرایـەوە (جەعفـەری صـادق) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: دەسـت و دڵفراواندەبێت و نان بەخەڵکیدەدات.

*هـەروەها دەڵـێن: لەسـوێندی حـەق و ناحـەق خۆیـدەپارێزێ و نەبەڕاسـت و نەبـەدرۆ سـوێند نـاخوات بەهـەمان شێوەش (کسائی) وادەڵێت.

*هـەروەها دەڵـێن: پیاوێکـە خـەڵکی زوڵم و زۆری لێدەکرێت.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الانسان)ی خوێند یا چەند ئایەتێکی لێخوێنـد یان بۆیخوێندرایـەوە (جەعفـەری صـادق) (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەڵێـت: دڵخۆشـدەبێ بەخانـەوادەی پێغەمبەر(ﷺ).

*هـەروەها دەڵـێن: سوپاسـگوزاری و بەندایـەتی و خواناسـی پێدەبەخشرێ و کاردەکاتەسەر دەروونی خۆی.

*هـەروەها دەڵـێن ئەوکەسـە خێـر زۆردەکـات و هەڵـەدەکات لـەکارێك کەسـوودی زۆرە باتەوبـەبکات، یـاخود خـاوەن ڕەوشـتێکی جوانـەو بـەختێکی باشیدەبێت و ژینی خۆشدەبێ.

*ئەگـەر لەخـەودا سـوورەتی (المرسـلات)ی خوێنـد یـان چـەن

*هەروەها دەڵێن: زانیاریو خواناسیو پێدەبەخشرێ یاخود پارەو پوول بۆ کۆمەڵێك خەرجدەکاتو سوپاسی ناکەن.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الفجر)ی خوێند یا چەن ئایەتێکی لێخوێند یان بۆیخوێندرایەوە (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: لەسوننەت دەرناچێ هەتا دەمرێ، هەروەها دەڵێت: هەتیوو و هەژارانی خۆشدەوێ.

*هەروەها دەڵێن: دوعایەکی خێر بۆ خۆیو موسوڵمانان دەکاتو سوودی دەبێت بۆیان.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (البلد)ی خوێند یا چەن ئایەتێکی لێخوێند یاخود بۆیخوێندرایەوە (جەعفەری صادق) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: سوێندێك دەخوات، پاشان پاشگەزدەبێتەوە، دەگونجێت درۆبکات یان دڵنیابێت دوای ترسوبیم.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الشمس) بخوێنێ یا چەن ئایەتێك یاخود بۆی بخوێندرێتەوە (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: لەولاتێکدا دەژی فەرمانڕەوایەکی دادپەوەری هەیە، یاخود سەرکەوتنو زاڵبوون لەسەرجەم کارەکانیدا بەدیدەکات.

*هەروەها دەڵێن: کوڕێکی چاکو باشی پێدەبەخشرێ لەدنیاداو دڵنیادەبێت، لەقیامەتیشدا ناترسێ.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الليل)ی خوێند یا چەن ئایەتێکی لێخوێند، یاخود بۆیخوێندرایەوە (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: ڕزقو ڕۆزی کەمدەبێتو شەهیددەبێو شەونوێژیشدەکاتو گوێڕایەڵی پەروەردگار دەبێت.

*هەروەها دەڵێن: ڕزقو ڕۆزی گرانو ئەستەم دەبێت.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الضحى)ی خوێند یان چەن ئایەتێکی لێخوێند یاخود بۆیخوێندرایەوە (نافع)و (ئیبن کثیر) دەڵێن: خێری دەستگیردەبێتو دڵنیادەبێت دوای ترسو بیمو دڵنیادەبێت دوای ناهومێدیو ئومێدەکانی بەجێدێت پاش بێهیوایی، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەنددەبێت، دەگونجێت چارەنووسو مەرگی نزیکببێتەوە.

*ئەگەر لەخەودا بینی سوورەتی (الانشراح)ی خوێند یا هەندێکی لێخوێند یاخود بۆی خوێندرایەوە (جەعفەری صادق) (ڕەزای خوای لێبێت) لەئابڕوچوونو نەخۆشی دوور دەبێت.

*هەروەها دەڵێن: مرۆڤێك منەتدەكات بەسەریا لەبری ئەوكارەی ئەنجامیدەدات بۆی.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (التین)ی خوێند یا بەشێكی لێخوێند یاخود بۆی خوێندرایەوە ئاگاداردەكرێتەوەو غەمو پەژارە دەخوات بەلام دڵنیادەبێت لێیو چارەنووسی باشدەبێ.

*هەروەها دەڵێن: كاروپیشەی پێغەمبەرانو پیاوچاكانی پێدەبەخشرێ، یاخود رزقو رزقو رۆزیو فەرپیتو تەمەندرێژیو، دەگونجێت سوێندبخوات.

*هەروەها دەڵێن: بەچەشنێ پەشیماندەبێتەوە كەدەرەنجامەكەی بەخێر كۆتایی دێت.

*هەروەها دەڵێن: فێری زانیاریەكی بەسوود دەبێتو خوداوەند لەشساغی لەئاینو دنیاو قیامەتی پێدەبەخشێ.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(العلق)ی خوێند یا بۆیخوێندرایەوە كورێكی دەبێتو پاشان بەندەیەكی پیاوچاكی لێدەردەچێت.

*هەروەها دەڵێن: قورئانخوێندنو ملكەچی پێدەدرێ یاخود فێری راڤەی قورئان دەبێ.

*هەروەها دەڵێن: هەرەشەی لەمرۆڤێكەوە پێدەگات.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(القدر)ی خوێند یان بۆیانخوێندەوە كرداری خێروچاكەی دەبێتو حاڵوباری باشدەبێو ئەجرو پاداشتی گەورەی دەستگیردەبێت.

*هەروەها دەڵێن: بەكەمترین هەوڵ سەركەوتن بەدەستدەهێنێتو ئەجرو پاداشتی وەك زیندوكردنەوەی شەوی (قدر)ە.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (البینة)ی خوێندەوە یان بۆیانخوێندەوە بەڵگەیە لەسەر ئاگاداریو مژدە.

*هەروەها دەڵێن: ویژدانی باشدەبێ دوای تێكچوونیو دڵنیادەبێت لەكارو بارەكانی پاش گومانو دوودڵی.

*ئەگەر سوورەتی (الزلزلة)ی خوێند یا بۆیانخوێندەوە لەلایەن شەیتانەوە لەخشتەدەبرێ لەو شوێنەدا.

*هەروەها دەڵێن: خوداوەند تووشی زەمین لەرزەی دەكات لەگەڵ خەڵكی ناموسوڵمانەوە.

*هەروەها دەڵێن: رزقو رۆزیو ماڵێكی پەنهان بەدەستدەهێنێت یان لەدەستەلاتدار دەترسێ.

*ئەگەر لەخەودا بینی سوورەتی (العادیات) دەخوێنێ یاخود بۆیدەخوێنێتەوە ، ئەگەر لەسەفەردابوو ڕێگەی لێدەگیرێ، ئەگەر وانەبوو خۆشییەکانی دنیا لەدڵیا شیریندەبێت.

*هەروەها دەڵێن: بەستنەوەی ئەسپو مەڕە.

*هەروەها دەڵێن: لەوانەیە زۆر یادی خودا دەکاتەوەو دەگونجێت تەمەنی درێژببیّو بەخێرایی باسبکرێ.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (القارعة)ی خوێندەوە یاخود بۆیخوێنرایەوە بەڵگەیە لەسەر مژدەو ئاگادارییی.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (التکاثر)ی خوێندەوە یا بۆیانخوێندەوە حەز لەکۆکردنەوەی دنیا دەکاتو قیامەت لەیاددەکات.

*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر تەنگی لەرزقو ڕۆزیو زۆر قەرزکردن.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (العصر)ی خوێند یا بۆیانخوێندەوە بەڵگەیە لەسەر مژدەو ئاگادارییی.

*هەروەها دەڵێن: فرە خێرو قازانجدەکاتو بەسەر دوژمناندا سەردەکەوێ.

*ئەگەر سوورەتی (الهمزة)ی خوێند یان بۆیخوێندرایەوە بەڵگەیە لەسەر ئاگاداری.

*هەروەها دەڵێن : سینە سافو پاکدەبێ.

*هەروەها دەڵێن: باسی خزمە نزیکەکانیدەکات یاخود فیتنەییدەکات.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الفیل)ی خوێند یاخود بۆیانخوێندەوە سەردەکەوێت بەسەر خزمو دوژمنانیدا.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر فەرمانڕەوایەك بێت سوپای دوژمن دەبەزێنیّو وڵاتان ئازاد دەکات، هەروەها دەڵێن: (حەج) دەکات یان فیتنەو ئاشوب دەکەوێتەوەو تێدا دوژمنانی خوا لەناودەچن.

*هەروەها دەڵێن: خوداوەند بەدرێژایی تەمەنی سزایدەدات بەترسو بیمو پیسیو گەندەڵی.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (قریش)ی خوێند یا بۆیانخوێندەوە بەڵگەیە لەسەر (حەج) ئەگەر لەڕێنومایییدەرانبوو ، وەگەرنا رزقو ڕۆزی خوداوەند دەخواتو سوپاسگوزاری لەسەر ناکات.

*هەروەها دەڵێن: رزقو ڕۆزی بەبێ ماندوبوون دەستگیردەبێت یاخود

لەسەفەرێکدا سوودو قازانجێکی زۆری دەستگیر دەبێت.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الدِّين)ی خوێندەوە یان بۆیانخوێندەوە لەوانە دەبێت بڕوایان بەڕۆژی قیامەت نییەو ڕێگر دەبێت لەچاکەو زەکاتیماڵەکەی نادات.

*هەروەها دەڵێن: دراوسێ‌و خەڵکی سوودی لێوەردەگرن‌و لێی ڕازیدەبن.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الكوثر)ی خوێند یاخود بۆیخوێندرایەوە لەگەڵ قیامەتخوازان دادەنیشێ‌و زاڵدەبێ بەسەر دوژمنانداو زۆر قوربانیدەدات.

*هەروەها دەڵێن: بەهۆی بەلاو نەهامەتی کەوارووی تێکردوە ئەجرو پاداشتی دەستدەکەوێ یاخود دەڵێن دەوڵەمەند دەبێت.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الكافرون)ی خوێندەوە یاخود بۆیانخوێندەوە بەڵگەیە لەسەر بیدعە، هەروەها دەڵێن: ئامادە دەبێت لەگەڵ کۆمەڵێ بیدعەچیدا یاخود باوەڕێکی پاك‌و پوختی بۆ دروستدەبێ‌و ئایندروست‌و لەشساغدەبێ.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی(النصر)ی خوێند یاخود بۆیخوێندرایەوە ئەگەر دەستەلاتداربوو ولاتان ئازاد دەکات، ئەگەر دەستەلاتدارنەبوو دەمرێ ، هەروەها دەڵێن: سەردەکەوێ بەسەر دوژمنانیداو لەگەڵ شەهیدان‌و پێغەمبەر (ﷺ) دەبێ.

*هەروەها دەڵێن: خۆشەویستێکی دەمرێ.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (تبت)ی خوێند یا بۆیانخوێندەوە ماڵ‌وسامان لەکارێکدا خەرجدەکات خوداوەند پێی ڕازی نییە، ئەگەر ماڵ‌و سامانی نەبوو دووزمانی لەنێوان خەڵکیدادەکات‌و نامرێ هەتاسەرجەم خانەوادەکەی نەمرن.

*هەروەها دەڵێن: یەکتاپەرستی پێدەبەخشرێ لەگەڵ منالی کەمدا، یاخود ژنێکی بێخێر دەگرێتە خۆی یان ماڵ‌و سامانی لەدەستدەدات.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الاخلاص)ی خوێند یاخود بۆیخوێندرایەوە خوداوەند بەتاك‌و تەنیا دادەنێ‌و هەرگیز کوڕی نابێت‌و کاتێ دەمرێ سەرجەم ئەندامەکانی خانەوادەی مردبن.

*هەروەها دەڵێن: ناوی مەزنی خوا دەزانێ‌و دوعای پێدەکات‌و دوعاکەی گیرادەبێ‌و حاڵ‌و باری باشدەبێ، هەروەها ئەگەر بترسێ دڵنیادەکرێ یاخود ئەگەر ستەمی لێکرابێ خوداوەند

سەریدەخاتو دەگونجێت تەمەنی بەسەرچوو بێتو چارەنووسی وادەو کاتی هاتبێت.

*هەروەها دەڵێن: تەوبەی پاكو بێخەوشو باوەڕی راستەقینە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر لەخەودا سوورەتی (الفلق)ی خوێند یاخود بۆیخوێندرایەوە بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵوباریو زاڵبوون بەسەر دوژمندا.

*هەروەها دەڵێن: یادوزیکری بەرزدەکرێتەوەو ناوی مەزنی خوداوەند فێردەبێو دوعاو نزای گیرابێ،

هەروەها دەڵێن: دنیابەچەشنێ باڵەکانی ئاوەڵادەکات بۆی خەڵکی ئیرەیی پێدەبەن.

*ئەگەر سوورەتی(الناس)ی خوێند یاخود بۆیخوێندرایەوە بەڵگەیە لەسەر گونجانی کارێك بۆی ، پاشان زاڵبوون بەسەر دوژمناندا.

*هەروەها دەڵێن: جادووی جادووگەرانی لێدوور دەخرێتەوە لەگەڵ وەسوەسەی شەیتان.

*هەروەها دەڵێن: بەوەسوەسە تاقیدەکرێتەوە، یاخود بەڵگەیە لەسەر کۆبوونەوەی خانەوادە یان خەڵکی سەلامەت دەبن لێی.

*هەرکەسێکیش لەلێکدانەوەی سوورتەکاندا رۆبچێت یا بۆ هەر مرۆڤێك بەپێی حاڵی خۆی بۆی لێکبداتەوە، ئەوەی لەقورئاندا تاقیکراوەتەوە بۆ خێربەدەستهێنانی یاخود دوورخستنەوەی شەڕ لەخەودا بەپێی مەرجەکانی خۆیدەبێت چ خێر یا شەڕ، ئنجا تەماشای سوورەتەکە بکەو بڕوانە ئەگەر وەك (مائدة)بوو ئەوە مژدەیەو (التوبة)شگەڕانەوەیە بۆلای خوداو (مریم) هاوسەر یان کوڕەو (الطلاق) تەلاقدان یاخود مردنەو سەرجەم سوورەتەکانی دیش دەتوانێ راڤەی لەسەر بکەی.

**سووره‌داڵ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: سوورەداڵ فەرمانڕەوایەکی خاوو خلیچكو توندوتیژو خۆبەکەمزانی ستەمکارە.

*ئەگەربینی بوو بەخاوەنی سوورەداڵێكو راوی بۆ دەکات دەستەڵاتو ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەربینی سوورەداڵێکی دڕندەی بۆ راونەکراو بەپشتیوانی رامیبکرد بەڵام وایبینی بەدەستی گرتوویەتی کوڕێکی دەبێت هەر بەمنداڵی دەبێت بەفەرمانڕەواو بەرپرس.

*ئەگەر ئەو داڵە لەدەستی هەڵفڕی منداڵەکە بەمردوویی لەدایکدەبێت یاخود زۆر ناخایەنێتو دەمرێت، بەچکەکانیشی منداڵەکانیەتی، یەکێکیش ژنێکی ناپاکەو خراپەی ناشاردرێتەوە.
*هەروەها دەوترێ: سوورەداڵ بەڵگەیە لەسەر دزو جەردەو قۆڵبڕە خێروچاکە لەهاوەڵانیان دەشارنەوە.
(نابلسی)دەڵێت: سوورەداڵ بەڵگەیە لەسەر:
+جەنگو کوشتار.
+پیاوی بەڕێز.
+ژنی داوێنپیس.
*هەموو سوورەداڵێك بەڵگەیەلەسەر ئەوەی شایستەی کوشتارە بەهۆی بێباوەڕیو هاوەڵپەیداکردنە.
**سووژن:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ژن ، ئەگەر سووژنێکی بەدەستیەوە بینی ئەگەر ژنەکەی دووگیانبوو دوو منداڵی دەبێت ئەگەر دووگیان نەبوو سەفەرێك دێتە ڕێی.
**سووکایەتی( گاڵتە ـ پێخۆشبوون ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ملکەچیو ڕسواییەو پلەوپایەو مەزنییە بۆئەوەی گاڵتەی پێدەکرێ مەگەر کەسێکی سووكو ڕسواو کەسێکی بەرزو پایەداربێ.
*ئەگەر بینی مرۆڤێك سووکایەتی پێدەکات لەوەی سووکایەتیدەکات ئێشو ئازاری پێدەگات سەردەکەوێ بەسەریاو زەفەری پێدەبات، هەروەها دەڵێن: حەقێکە کەسی قسەپێگوتراو هەیەتی لای قسەپێدەر.
*ئەگەر قسەپێدەر پادشابوو قسەپێگوتراو باشترە لەقسەپێدەر.
**سووککردنی باروقورسایی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: دانانو سووککردنی بارو قورسایی لەسەر مرۆڤو ئاژەڵ بەڵگەیە لەسەر چاکەکردن لەگەڵ کەسێکدا بیناسێت یا نەیناسێت.

## س ۆ

**سۆڵ( خوف ):** لەپێکردنی سۆڵ سەفەرکردنە لەدەریادا لەگەڵ پۆشینی جلوبەرگی قەڵغان، سۆڵی نوێش قەڵغانە لەخراپەو پارێزگاریش لەماڵو دارایی.
*ئەگەر چەکی پێنەبوو غەمو پەژارەیەکی توندو تەنگەبەرییەکە سەختو گرانترە لەغەمو پەژارە.
*سۆڵی تەنگ قەرزاریو زیندانیو کۆتو بەندە، ئەگەر فراوانبوو غەمو پەژارەیە بەهۆی ماڵو داراییەوە دروستدەبێت، ئەگەر نوێبوو دەدرێتەپاڵ پارێزگاریو

باشتره بۆ خاوەنەکەی ، ئەگەرشڕبوو لەپارێزگاریدا لاوازترە، ئەگەر درایە پاڵ غەمو پەژارە تۆکمە نابێتو لەدەروەوە دوورە.

*ئەگەر سۆڵەکە لەجلوبەرگو جبە دروستکرابوو زیادەبوونی پلەوپایەو شکۆمەندیو بژێوییە.

*سۆل لەدەمی سەرەتای زستاندا چاكو باشەو لەهاویندا غەمو پەژارەیە.

*ئەگەر سۆلێکی بینی بەلام لەپێینەکرد ماڵو داراییەکی لەنەتەوەی عەجەمەوە دەستدەکەوێت.

ونکردنی سۆل دەدرێتەپاڵ پارێزگاریو تیاچوونی جوانکاری، خۆئەگەر درایە پاڵ غەمو پەژارەو قەرزاریو دەروو قوتاربوونە لەناخۆشی.

*لەپێکردنی سۆل بەشێوەیەکی پەرتوبڵاو بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری کچ، ئەگەر لەژێر پێیدا دڕاویو کون هەبوو بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری لەگەڵ بێوەژندا، ئەگەر ونبوو ژنەکەی دەکەوێت ئەگەر فرۆشتی ژنەکەی دەمرێت.

*ئەگەر بینی گورگێك یا دێوێك بازیدا بەسەر سۆلەکەیدا پیاوێکی خراپ ناپاکی لەگەڵدەکات بەوەی دەست لەگەڵ ژنەکەی تێکەڵدەکات.

*ئەگەر سۆلێکی قەیتانداری لەپێکرد غەمو پەژارەی لەلایەن ژنەکەیەوە پێدەگات.

*ئەگەر لەبەشی خوارووی سۆلەکەدا پینەی پێوەبوو هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکدا دەکات کوڕێکی هەیە.

*لەپێکردنی سۆلی سوور بۆ یەکێك بیەوێت سەفەربکات باش نییە.

*ئەگەر بینی دوو سۆلی لێدزراوە دووخەمو خەفەت رووی تێدەکاتو، لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+ئەڵقە.

+ماڵو دارایی.

+خۆپاراستن لەخراپە.

*ئەگەر بینی دایکەند غەمو پەژارەو تەنگەبەری دەرەوێتەوە.

*لەپێکردنی سۆل لەگەڵ جبە بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی شکۆمەندیو رزقو رۆزیی.

*بینینی سۆل لەسەرەتای زستاندا بەڵگەیە لەسەر خێرو لەکۆتایی هاوینیشدا بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە.

*ئەگەر بینی سۆلەکەی کەوتوەتە نێو بیرێکەوە یان سووتاوە ژنەکەی دەمرێت.

* سۆل بەئاژەڵ لێکدەدرێتەوە، هەر رووداوێك بێت بەسەر سۆلەکەیدا روو لەئاژەڵەکانی دەکات.

* ئەگەر سۆلێکی کۆنەی لێون بیبیّ غەمو پەژارەی قەرزاری لەکۆڵدەبێتەوە.

* ئەگەر یەك تاك سۆلی ون ببێت نیوەی ماڵەکەی تیادەچێت، ئەگەر هەردوو سۆلەکەی بەیەکەوە ونبوو هەموو ماڵو دارایيەکەی تیا دەچێت.

* ئەگەر بینی قاچدەکات بە سۆلەکەیدا ژنێکدەکات بەهاوسەریخۆی.

* ئەگەر سۆلێکی دۆزییەوە بەڵگەیە لەسەر سەرقاڵبوون بەدنیاو پشتگوێخستنی قیامەت یاخود سەرقاڵبوون بەدنیاوەو پشتگوێخستنی فەرزەکان.

* سۆلی حوشتر لەخەودا هێزو سەفەرە، دەگونجێت سۆلی حوشتر بەڵگەبێت لەسەر ئاسانکاری بۆ کاروباری باشو پەسەند.

**سۆڵدروستکەر:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی خاوەن زانیاری یاخود لێکدەرەوە قسەو وتە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر راڤەکاری خەو یان ئەوەی ئاگاداری کالآو گەنجینەیە.

## س ە

**سەبەتە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سەبەتە بەڵگەیە لەسەر مژدەو ئاگادارکردن، ئەگەر جۆرو ناوەڕۆکی بەدڵبوو مژدەیە، ئەگەر لەناوەڕۆکدا بەدڵنەبوو ئاگاداریيە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا مژدەیە دەدرێتە پاڵ ئەوەی کەلەخۆیگرتوە، ئەگەر سەبەتەیەکی بینی ترێی سپی تێدابوو رزقو رۆزییەکە لەلایەکەوە رووی تێکردوە خۆی بۆ ئامادە نەکردوە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی (سیل).

سەبەتەچن(سەبەتەفرۆش): (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی سەبەتە دروستدەکات یان دەیفرۆشیّ بینینی بەڵگەیە لەسەر چنەر یان بەرگدروو یاخود بیناسازی لانەو ماڵ یاخود ئەندازیار.

*دەگونجێت بینی بەڵگەبێت لەسەرئەوەی مردوو دادەپۆشیّ لەگۆڕدا.

**سەر( سەلك )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: سەر لەلێکدانەوەدا سەرۆکی مرۆڤە لەژێردەستیدا کاردەکات یاخود ئەو سەرمایەیەکەدەیدۆزێتەوە.

*ئەگەر بینی سەری پتر لەئەندازەی خۆی گەورەبوو رێزو شکۆمەندی زیاددەکاتو بەپێچەوانەوە.

*ئەگەر بینی دووسەر یا سیانی هەیە زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا ئەگەر پاڵەوانبێت بەلام ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت، ئەگەر دەوڵەمەندبوو منداڵی چاكو باشی دەبێت، گەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێو ویستخوازی خۆی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بازرگانێك بینی سەری شۆڕە زیاندەکات لەبازرگانییەکەیدا ، ئەگەر پیاوێك بینی سەر شۆڕەو هەڵواسراوە تەمەندرێژدەبێتو پڕ لەهەوڵو سەرزەنشت بەپێی چیرۆکی (هاروت)و (ماروت).

*ئەگەر بینی سەری شۆڕەو خۆی چەماندوەتەوە لەنێو کۆمەڵێکدا گوناهو هەڵەیەکی ئەنجامداوەو لێی پاگەشەزدەبێتەوەو تەوبەدەکات، بناغەی ئەم خەونەش بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی بەپێی ئایەتی: ﴿وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ﴾(یس:٦٨).

*ئەگەر سەری بەهەڵگەڕاوەیی بینی بۆیەکێك لەسەر سەفەربێت رێگرێکی بۆ پێشدێتو ئەوەی حەزی پێدەکات بەو نزیکانە نایبینێ بەڵکو دواتر بەدیدەکات.

*بۆیەکێك موسافیرێکی ئاوارەی هەبێت بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆی دوای دواخستنو هێواش رۆیشتنی ئەو رووداوە.

*سەرومل ئەگەر مرۆڤ بەدییان بکات کێمو برینو ژانە ، ئەمەش نەخۆشییە بۆسەرجەم خەڵکی بەشێوەیەکی هاوسەنگ.

*ئەگەر بینی سەریبوە بەسەری سەگو گوێدرێژو ئەسپ یان هەر ئاژەڵێکیتر رووبەماندوبوون هەنگاودەنێ.

*ئەگەر بینی سەریبوە بەسەری فیلو شێرو پڵنگو گورگ لەبەجێهێنانی کاروبارەکانیدا پلەوپایەیەکی بەرز بەدەستدەهێنێتو سوود لەپلەداریدەکاتو زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا.

*ئەگەر سەری بوبووبەسەری باڵندە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر زۆر سەفەرکردن.

*ئەگەر سەری خۆی بەچەورکراوی بینی خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر باشی باپیرەی.

*ئەگەر چەن سەرێکی بڕاوی بینی خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر ملکەچبوونی خەڵکی بۆی.

*ئەگەر بینی سەری مرۆڤێکی خراپی خوارد باسی سەرۆك و فەرماندەیەکدەکات و ماڵ و دارایی لەهەندێك بەرپرسیترەوە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی سەرێکی بەلێنراوی خوارد ماڵی خۆیەتی دەیخوات.

*ئەگەر بینی سەرمایەی خۆی بەدەستی خۆی گرت ماڵ و داراییەی کەپێیدەگات زوربەی خوێنباییە کەمترینی هەزار درهەمە، ئەم خەونە بەڵگەیە لەسەر رووداني پەیمانبەستی لەنێوان خۆی و پیاوێك قەرزی لایەتی بەپێی ئایەتی: ﴿وَإِنْ تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُم﴾ (البقرة: ٢٧٩).

*ئەگەر بینی سەرکەوت پێوەی بێتەوەی لێی بدرێ لەسەرۆك و بەرپرسەکەی جیادەبێتەوە.

*ئەگەر سەری براو هەڵیگرت و نایەوە بەسەری خۆیەوەو چاکبوەوە لەجیهادو تێکۆشاندا دەکوژرێ.

*ئەگەر بینی سەری دەرکەوتوە ماڵ و دارایی بەئەندازەی ئاینداری دەستدەکەوێت.

*سەر بەرِم و دارێکەوە سەرۆکێکی پلەوپایەبەرزە.

*ئەگەر سەرێك ببینێ لەدەفرێکدا خوێنی پێوەبێ سەرۆکەکەی درۆدەکات لەگەڵی.

*ئەگەر ببینێ لەملیدەدرێت و سەری لێی جیادەبێتەوە ئەگەر نەخۆشبوو چاکدەبێتەوە ، ئەگەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە یاخود حەجی بۆ پێشدێت، ئەگەر لەنارەحەتیدابوو دەرووی لێدەکرێتەوە، ئەگەر ئەوکەسەی ناسی کەلەملیدەدات لێدانی ئەو لەسەردەستی ئەو دەبێت.

*ئەگەر ئەوەی لێیدا منداڵێکی نابالغبوو پشەر و دەرووە بۆی لەناو نارەحەتی و نەخۆشی کەتێدایەو مردنیەتی لەسەر ئەو حاڵ وبارە.

*هەروەها ئەگەر بینی و نەخۆشبوو نەخۆشیەکەی درێژ دەبێتەوەو گوناهی لێهەڵدەوەرێ و بەباشترین حاڵ وبار بەدیداری خوداوەند دەگات و دەرووی لێدەکرێتەوە.

*هەروەها ژنی زەیستان و نەخۆش و ئەوەی لەدەریای دوژمندابێت ئەگەر

لەگەردنـــدانی یـــەکێکی بینـــی هـــیچ ناڕەحەتیەکی نەبوو لـەو نـازو نیعمەتـە دەبڕێتو دەستەلاتەکەی کۆتایی دێتو حاڵو باری لەبنەڕەتەوە دەگۆڕێ.

* ئەگەر پادشا یـاخود فەرمانڕەوایـەکی بینـــی دەدات لەگـــەردنی ئـــەوکات فەرمانڕەوا پەروەدگارە لەغەمو پەژارە قوتاریـــــدەکاتو پـــــشتگیریدەبێ لەکاروبارەکانیدا.

* ئەگـــەر بینـــی پادشـــایەك دەدات لەگـەردنی بەردەستەکانی لـەتاوانباران دەبووریو گەردنیان ئازاددەکات.

* ئەگـــەر بینـــی لەگـــەردنی دەدەن بەفـــەرمانی فەرمانڕەوایـــەك یـــاخود لەرێگـەدەگیرێ یـان لەجەنگدا خراپـە بۆیەکێك باوكو دایکی زیندوونین و کـوڕی هەبێت چونکە سەر بەدایكو دادەنرێتو هۆکاری ژیـانو بەکوڕیش دەچوێنرێ چونکە وێنەی خۆیەتی.

* ئەگـەر کەسـێکیتر یـاخود ئـەوەی فەرمانی کوشتنیان بەسەراداوە بینـی باشـە چـونکە بـەلاو نەهامـەتی یـەکجار روو لـەمرۆڤ دەکـاتو بۆجـاری دووەم رووی تێناکات.

* بۆ پـارەگۆڕەرو گەنجینـەدار بەڵگەیـە لەســەر ســەرمایە، بــۆ موســافیریش بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی، بۆئەوانـەی نـــاکۆكو بەربـــەرەکانیکارن بەڵگەیـــە لەسەر زاڵبوون چونکە ئەگـەر لـەشولار سـەری لێبکرێتەوەهـەرگیز چارەسـەری نییە.

* ئەگەر سەری خۆی لەدەستدا ببینـێ باشە بۆیەکێك منداڵی نەبێت.

* ئەگـەر سـەریخۆی لەدەسـتیا بینـیو ســـەرێکی تریـــشی بینـــی بەســـەر لەشولاریـــەوە بەڵگەیـــە لەســـەر بـەرەنگاربوونی بـەلاو نەهامەتییـەکانو هەنـــدێك لـــەوکاروبارە نارێکانـــەی چاکدەکات.

* دەگێڕنـــەوە پیاوێـــك دێـــت بـــۆلای پێغەمبـــەر(ﷺ)و دەڵێـــت: ئـــەی پێغەمبـەری خـوا لەخـەودابینیم سـەرم لەلاشـــــەمکرایەوەو بەچـــــاوێکم تەماشامدەکرد، پێغەمبەر (ﷺ)بزەیـەك گرتـــیو فـــەرمووی: بـــەکام چـــاوت تەماشـــاتدەکرد؟ ئەوەنـــدە مایـــەوە کەچارەنووســـــی مـــــابوو، پاشـــــان پێغەمبـــەر(ﷺ) بـــۆلای پـــەروەردگار گەڕایەوە.

* (ئـــیبن مـــریم) لەخـــەودا بینـــی (٦٠)کـــەنیزەك خۆیـــان دەکـــەن بەماڵەکەیـــدا بەدەســـتی هـــەر کەنیزەکێکیانـــەوە ســـینیەك هـــەبوو

سـەری مرۆڤێکـی شۆڕاووشـانەکراوی لەسەربوو وەك ئـەوەی یـەکێکیش ئـەم ئایەتـەی دەخوێنـدەوە: ﴿وَمَاكَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللهُ إلاَّ وَحْيًا أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ﴾ (الشورى: ٥١) خەونەکەی گێڕایەوەو پێیانوت: خەلیفە دەتکـات بـەدەرگاوانو پـەردەداری خـۆیو شەسـت هـەزار دینـار بەدەسـتدەهێنیت، بەوچەشـنەبوو کەبۆیان لێکدایەوە.

*ئەگەر سـەری خـەڵکی بـەبڕاوی بینـی بەدەسـتیەوە خـەڵکی بەملکەچـی دێنەبـەردەمیو دەگونجێـت خـەڵکی لەوێدا کۆببنەوە.

*ئەگـەر بینـی بـوە بـەخاوەن سـەرێك مـاڵو سـامانێکە دەسـتیدەکەوێت کەمەکـەی (هـەزار)درهەمـەو زۆرەکـەی (هەزار)دینارە.

*ئەگـەر پێـشەوایەك بینـی سـەری گەورەبوە زیادەوهێزو دەستەڵاتە.

*ئەگەر سەری خۆی بینی بوە بەسەری بەرانێك دادپەوەردەبێت.

*ئەگەر بینی سەریبوە بەسەری سـەگ ستەمدەکاتو بـەخراپی مامەڵـە لەگـەڵ ژێردەستەکانی دەکات.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگـەر بینـی سـەری گـەورەبوە سـەرۆکایەتی دەکـات لـەنێو نەتەوەکەیدا.

*ئەگـەر بینـی سـەری بـچووکبوەتەوە ئەگەر ژیرو عاقڵ بێت دەبێت بەنـەزانو نـەفام ، ئەگـەر زانـابوو دەبێـت بەکەسـێکی گێـلو کـەودەن ، ئەگـەر سـەرۆکبوو لـەکارو سـەرۆکایەتی لادەبرێت.

*ئەگـەر سـەری خـۆی بینـی لەلاشـەیکراوەتەوە بـەبێ لێـدان، لەپەروەردگارەکەی دووردەکەوێتەوە.

*سەر بەڵگەیە لەسەر سەرمایەو چەند سـەرێکیش بەڵگەیـە لەسـەر مـاڵو دارایی.

*ئەگەر سەری مرۆڤێکـی بەدەستیەوە بینـی بەئەنـدازەی هـەزار دینـاری دەسـتدەکەوێ یـان بەئەنـدازەی هـەزار درهـەم یـان سـەد بـەپێی حـاڵی خاوەنەکەی.

*سـەر بـەڕێزترین پارچـەو بەشـی ئەنـدامی مرۆڤـەو بەڵگەیـە لەسـەر پلەوپایـەو سـەرکردایەتی سـەرۆك لەهـەموو شـتێکدا وەك بـاوكو دایـكو مامۆستاو پەروەرشیارو فەرمانڕەوایە.

*سەر بەڵگەیەلەسەر:

+مەنجەڵی قوڵفدار.

+کاڵەك.

+قەڵای پادشاو گەنجینەکانی.
+جامانەو کڵاووسەریان.
+تاجوسەوڵەدانی پادشا.
+خودەی جەنگاوەر.
+کەشتی ئاسمانی.
+کێشانەو پێوانە.
+کۆترو فڕین.
+هەموو شوێنێك هەڵمی تیا پەنگبخواتەوە بۆ بەرژەوەندیەك.
+چادری کۆڵەکەدار.
*دەگونجێت سەری زانا بەڵگەبێت لەسەر زانیارییەکەی.
*بۆ پیشەوەریش بەڵگەیە لەسەر پیشەکەی.
*هەروەها دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+باسێکی جوانو شیاو.
+ژیانو مردن.
*ئەگەر سەری جوانو هەڵکەوتووبێ یان لەئەندازەی خۆی گەورەتربێو لەبەرچاو ناشیرین نەبێت بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندیو بەرزیو رزقو رۆزی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانیارییەکی فراوان یان دانایی یاخود ژیریو ئەقڵ، بەڵام ئەگەر سەری بچووکبوو بەڵگەیە لەسەر نەمانو تیاچوونی پلەوپایەو کەمبوونەوەی ماڵو دارایيو کەوتنە نێو نەزانینەوە.
*ئەگەر لەخەودا چەند سەرێکی هەبوو وەچەی پێدەبەخشرێ یان زانیارییەکی بەسوود یاخود زەویوزاری تیاچوو مندالو شوێنکەوتەو ماڵو دارایی، وەگەرنا خانەوادەکەی زۆردەبنو ئەرکی سەرشانی قورسوگراندەبێتو سوودو قازانجی کەمدەبێتەوە.
*ئەگەر سەری لەدەستبدات بەڵگەیە لەسەر خودی خۆی.
*ئەگەر بەدەستی خۆی سەری لێکردەوە خۆیدەکوژێت بەهۆی خراپی هەڵسوکەوتو کاروبارەوە، یان بەباشی رێورەسمەکانی نوێژ بەجێناگەیەنێت یاخود پەیوەندی نێوان دەبچڕێ لەگەڵ کەسێکی ئازیزدا یا ناپاکی لەگەڵ باوكو گەورەیەکیدا ئەنجامدەدات یاخود ئەوەی سەر بەڵگەیە لەسەری.
*ئەوەی روو لە(سەر) دەکات لەخێرو شەڕ یان ئەوەی لەرووخسارو دەستو ئانیشكو جوموورگەدا روودەدات لەزیادەوکەمی وابەستەی دەستنوێژو تەواویو پاكو بێگەردیدەکرێ.
*ئەگەر بینی سەری لێبوەتەوە سەرمایەکەی لەکیسدەچێت کەبەهۆیەوە دەژی ، یان دەگونجێت

سەری بتاشێ و کوڕەکەی فرێبدات لەگەرمادا یان ژوورەکە بڕوخێنێ یان سەری ماڵەکەی لاببات.

* ئەگەر بینی سەری بەدەستیەوەیەتی و تەماشایدەکات هەڵسووکەوتی خەوبینەرە بەسەرمایەو پارەکەیەوە.

* ئەگەر بینی سەریدەبات نەخۆشیەك رووی تێدەکات.

* ئەگەر بینی قسەو گفتوگۆ لەگەڵ سەری خۆیدەکات خێروچاکە رووی تێدەکات.

* ئەگەر لەخەودا سەری مرۆڤ گۆڕا بۆسەری گوێدرێژ لەنوێژدا بەر لەئیمام سەری بەرزدەکاتەوە بەپێی ئەو فەرموودەیەی کەلەپێغەمبەرەوە دەیگێڕنەوە[1]. یان دەبێت بەکەسێکی نەزان.

* سەری مەڕو مانگاو هیتر ئەوەی دەخورێ ئەگەر بینی شتێکی لێکڕی دەخرێتە نێو تەنورەوەو قەڵەوبوو سوود لەسەرکردەو مامۆستایەك دەکات جێگەی سوودو قازانجە، ئەگەر لەڕولاوازبوو مامۆستاکەی هیچ سوودو قازانجێکی نابێت، ئەگەر بۆگەن و پیسبوو مامۆستاکەی ستایشێکی خراپیدەکات.

* ئەگەر بینی سەری مەڕێك یا مانگاو گاو حوشتر دەخوات و خراپبوو غەیبەتی بەرپرس و گەورەکەیدەکات، ئەگەر لێنرابوو یاخود برژابوو ماڵ و دارایيەکی دەستگیردەبێت لەلایەن فەرمانڕەواو دەستەلاتدارەکەیەوە.

* سەری مەڕ سەرمایەیەکە زیادەکەی (دە)هەزار درهەمەو کەمەکەشی (هەزار)درهەمە.

* خواردنی مۆخ ماڵێکی شاراوەیە.

* خواردنی چاو ماڵی سەرکردەو فەرمانڕەوایە.

* ئەگەر بینی سەری مەڕو پاچەکەی دەخوات شکۆمەندی ماڵ و دارایی میراتی بۆ دەمێنێتەوە.

**سەرانە**: (نابلسی)دەڵێت: بۆئەوەی کەدەیدات لەخەودا گەر موسوڵمانبێت و بیدات بەبێباوەڕان بەڵگەیە لەسەر ملکەچی و سەرشۆڕی ، ئەگەر لەبێباوەڕان وەرگیرا بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندی و سەرکەوتن.

**سەرناو( سەرپێشاو )** : (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بۆ رەبەن بەڵگەیە

---

[1] (بوخاری) (٦٩١) و(مسلم) لە(الصلاة)دا (١/١١٦/٣٢١)(نووي)لەفەرمودەیەکی(ئەبی هورەیرە)وە.

لەسەر ژن کەبەچاکە دایدەپۆشیٚ، دەگونجێت چونەکەی بەڵگەبێت لەسەر خۆشاردنەوە بەکردارو دەستبڕین‌و دووڕوویی.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیەلەسەر عەورەتی خانەوادەو شەکەتی‌و هەژارییان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەر دەچێتەلای‌و نهێنی‌و عەورەتی دەبینیٚ، یاخود بەڵگەبێت لەسەر باران کەماڵ‌وسامان‌و گەنجینەی شتی فرۆشگای تێدایە، هەروەها لانەی پشوودانەو خۆی تێدا خاڵیدەکرێتەوە، ئەگەر پڕبوو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دووگیانی هاوسەر یان موڵک‌و سامانی خزمەتکار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زۆری ماڵ‌و سامان یاخود پێویستی بوون بەپارە هەتا ئەونەخۆشیانە برەوێنەوە.

*ئەگەر پیسبوو بەشتێك‌و بۆنی نەهات بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی خێرو دەگونجێت داواوخوازی بەجێنەیەت، ئەگەر خواردی لەوانەیە پاشگەزببێتەوە لەوەی بەخشیویەتی یان کردوویەتی بەخێر یاخود لەوانەیە بەڵگەبێت لەسەر خراپەو حەرامخۆری حوکمەکەشی وەك یەکێك وایە رشانەوەی خواردبێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: "ئەوەی لەخەڵات‌و دیاری خۆی پەشیمان دەبێتەوە وەك یەکێك وایە رشانەوەی بخواتەوە".

*رشانەوە ماڵێکی حەرامەو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژن، ئەگەر فروان‌و پاك‌و دیاربوو بۆنەکەی ژنەکەی خۆش مامەڵەیەو پاکێتی‌و فراوانی گوێڕایەڵی‌و کەمی بۆگەنی‌و باشی پیاهەڵدانیەتی، ئەگەر تەنگ‌و پڕبوو خاوەنەکەی شوێنێکی تیا بەدینەکرد دابنیشیٚ یاخی‌و گومڕایە، ئەگەر بۆگەنبوو زماندرێژ دەبێت.

*قوولّی بیری سەرپێشاو یان زێرابەکەی بەجێهێنانی کاروبارەکانیەتی، ئەگەر تەماشایکردو خوێنی تێدابەدیکرد لەکاتی بێنوێژیدا دەچێتە لای ژنەکەی.

*ئەگەر بیرو زێرابەکەی بینی پڕبوە رێکخستن‌و رێگری خەڵکیە لەخێرو دەستگیرۆیی لەترسی زیادەڕەوی.

*ئەگەر دارێکی بەدەستیەوە بینی دەیجووڵاند لەبیرێکدا لەماڵەکەیدا ژنێکی تەلاقدراو هەیە، ئەگەر بیرو زێرابەکە پڕبوو ترسی هەڵچوونی نەبوو ژنەکەی دووگیانە.

*ئەگــەربینی لەسەرپێــشاو دانــراوە غــەدرو ناپــاکی لەگەڵدەکــەن ئەگــەر دەرگاکەشیان لێداخست دەمرێ.

**سەرئێــشە:** (ئــیبن ســیرین) دەڵێــت: سەرئێــشە گونــاهو تاوانــەو دەبێــت تەوبــەی لێبکــرێو کردارێکــی چــاکە ئەنجامبدات بــەپێی ئایــەتی: ﴿ أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴾ (البقرة: ١٩٦).

(نابلسی) دەڵێت: سەرئێشە ناخۆشیو بۆڵەیە بۆ یەکێك بەڵگەبێت لەسەری، سەرئێشە لێکدانەوەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرۆك.

*هەروەها دەڵێن: گوناهو تاوانەو دەبێ تەوبەی لێبکرێ.

**سەرباری مووچە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گواستنەوەی قسەو بەجێهێنانی پێداویستی.

*دەگونجێــت بەڵگــەبێت لەســەر خزمەتکاری لانەو ماڵ.

**سەرباز:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەوەی کۆمەڵــە ســەربازێك ببینــێ جــەمبەون لەسەر تیاچوونی بێکارو سەرکەوتنی ڕاستبێژو حەقپەروەران بەپێی ئایەتی: ﴿فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَا قِبَلَ لَهُم بِهَا﴾ (النمل: **٣٧**).

*کــەمی ســەرباز بەڵگەیــە لەســەر ســەرکەوتنو زەفــەر پێــبردن بــەپێی ئایەتی: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ (البقرة: **٢٤٩**) بینینی سەرباز قامچی بەدەستەوەبێت یــان تــیرورم بەڵگەیــە لەســەربژێوی باشوچاك.

(نابلــسی)دەڵێــت: بەڵگەیــە لەســەر ســەربازانی پــەروەردگارو هــەروەها پــەریو فریــشتەکانی سـۆزو بــەزەیین لەگەڵ فریشتەی سزاو خەشم.

*ئەگــەر مرۆڤێــك بینــی بــوە بەســەرباز دەســــــــتەڵاتو فـــــــەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت، هەروەها دەستەڵات بەسەر وڵاتێکدا بەدەستدەهێنێت بەبێ ماندوبوون.

*ئەگەربینی ناوی لەدیواندا تۆمارکراوە خێرێــك بەدەســتدەهێنێت بەســیەتیو پێداویــستی پڕدەکاتــەوە یــاخود بێئەوەی خوازیاربێت پێیدەگات.

*ئەگــەربیبینێ بــوە بەســەرباز ئەگــەر نەخۆشبێت دەمرێت، وەگەرنا بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو زەرەر.

*ئەگــەربینی دەبێــت بەســەرباز یــان دەیبــەن بــۆ ســەربازی بــۆ نــەخۆش بەڵگەیــە لەســەر مــردن، دەگونجێــت بەڵگــەبێت لەســـەر شکـــستو غەموپەژارەو جموجووڵ لەسەفەردا.

*ئەگەر کۆمەڵە سەربازێك بینیێ لە(شام)ەوە دێن یان لەلای (عێراق)ەوە یا لەلای (یەمەن)ەوە بەڵگەیە لەسەر جیاوازیو تەوقەسەریان.

*بینینی سوپا بەڵگەیە لەسەر ترس‌وبیم، ئەگەر سوپای بێباوەڕان پتربوو لەسوپای موسوڵمانان سەرکەوتن بۆ موسوڵماناندەبێت، بیستو هەزارو سەدو سێ هەزارو پێنج هەزار مژدەیەو بۆ جەنگاوەر سەرکەوتنە بەسەر بەدخوو بێباوەڕاندا.

*دەگونجێت دەستەواژەی (سەد) بەڵگەبێت لەسەرئەوەی پەروەردگار دەیگێڕێ لەجیهاندا لەسەری هەموو (سەد)ساڵێکدا.

*دەگونجێت هەزار بەڵگەبێت لەسەربینینی شەوی(قەدر) ، ئەگەر سەربازان پێغەمبەرو پادشاو زانایان لەگەڵدابوو سەرکەوتنی پەکتاپەرستانە.

*ئەگەربینی سەرباز روو لەوڵاتێك یان رێگەیەك دەکەن ئەو ساڵەیان باراناوی دەبێت.

*هەروەها وتراوە: سەربازان سەرکەوتنە بۆ باوەڕداران‌و سزاو تۆڵەیە لەستەمکاران.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: هاتنی سەرباز بۆ شارێك بەڵگەی بارانبارینە تێیدا.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا پێغەمبەر یان فەرمانڕەوا یا زانای لەگەڵدابوو سەرکەوتنە بۆ یەکتاپەرستان.

*ئەگەر بینی لەنێو کۆمەڵێکی کەمدایە تووشی شەڕو جەنگدێت‌و سەردەکەوێت بەسەریاندا.

*هەروەها دەڵێن: سەرباز سەرکەوتنی باوەڕداران‌و تۆڵەسەندنە لەستەمکاران.

**سەربان:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ژنێکی پلەوپایەبەرزە ، هەروەها دەڵێن: پیاوێکی پلەوپایەدارە ، ئەوەی بەسەربانێکدا بڕوات بەلاو نەهامەتی لەلایەن دەستەلاتدارەوە پێدەگات.

*دانیشتن لەسەربان لەوەرزی هاویندا بەڵگەیە لەسەر پشوودان‌و داپۆشین‌و رەواندنەوەی غەم‌و پەژارەو چاکبوونەوە لەنەخۆشی‌و دەرکەوتنی حاڵ‌وبار.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: سەربان پیاوێکی پلەوپایەبەرزە، ئەگەر لەداربوو پیاوێکی لەخۆباییە.

*ئەگەر سەربانێکی بینی خەریکە دەڕمێ بەسەریا ترس‌و بیم رووی تێدەکات لەلایەن پیاوێکی پلەوپایە

بەرزەوە، ئەگەر خاكو خۆڵ كەوتە خوارەوە بەسەرياو جلەكانی خۆڵاویبوون لەدوای ترس‌وبيم ماڵ‌و سامانی دەستگيردەبێت.

*ئەگەر كۆڵەكەيەك رما مەرگی خاوەن ماڵە ياخود بەلاو نەهامەتيەك رووی تێدەكات.

*ئەگەر بينی پايەكە درزی تێبوو بوو بەدوو كەرتەوە بەلام نەكەوت سەرجەم ئەوەيە كەدەدرێتەپاڵ ماڵەكە.

*دارو كۆڵەكە لەبيناسازيدا پياوێكی دووڕووی باركێشی خەڵكييە شكانی مەرگی پياوێكە بەو سيفەت‌و تايبەتمەنديانە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بينی چوە ژێرسەربانێك‌و بينی ئاسمانی لێگرت درز و جەردە رەوودەكەنە ماڵەكەی‌و شتومەكەكانی دەدزن.

*ئەگەر بينی سەربانی ماڵەكەی ئاوی لێدەچۆڕێ گريان‌و شيوەنە بۆ مردوويدەكات يان بۆ كەسێكی بيمارو نەخۆش.

*ئەگەر بينی باران خاك‌و خۆڵی سەربانی شتەوە هەژارو نەدار دەكەوێت.

*ئەگەر خۆی لەسەربانی ماڵەكەی بينيەوەو دەيويست دابەزێ بەلام نەيدەتوانی زيندانيدەكرێ.

*ئەگەر بينی سەربان دەڕوخێت بەسەريا سزاو خەشم رووی تێدەكات.

*ئەگەر ئەستێرەی لەژێر سەرباندا بينی سەربانەكەی دەڕمێ‌و ئەستێرەكان دەبينێ.

**سەربڕين:** (ئيبن سيرين) دەڵێت: ئەگەر سەربڕاوێكی بينی بەلام نەيزانی كێ سەريبڕيوە بيدعەيەكی داهێناوە يان گەواهيەكی درۆی خستوەتە ملی.

*ئەگەر باوك‌و دايك‌و كوڕەكەی سەربېڕێت ئازاريان دەدات‌و دەستدرێژيدەكاتە سەريان.

*ئەگەر ژنێك سەربېڕێت لاقەيدەكات، هەروەها ئەگەر ئاژەڵێكی مێينەی سەربڕی لاقەی ژنێكدەكات ياخود كچێك دەكات بەژن.

*ئەگەر ئاژەڵێكی نێرينە سەربېڕێت لەدواوە كاری نێربازيدەكات.

*ئەگەر بينی منداڵێك سەردەبڕێت‌و سووريدەكاتەوە بەلام نەبرژا ستەمی لەباوك‌و دايكی خۆيكردووە، ئەگەر منداڵەكە جێگەی ستەم‌و زۆرلێكردنبوو مافی دەخوات‌و قسەووتەی ناشياودەكات بەرانبەری.

*ئەگەر منداڵەکە لەوانەبوو قسەی دەربارە دەکرا باوکو دایکی زوڵمو ستەمدەکەن لێی بەدرۆ تاوانباریدەکەن، خەڵکیش زۆر دەڵێن لەبارەیانەوە هەموو ئەو بۆچوونانەش بەتاڵن ئەگەر بەئاگر نەیبرژێنیّ.

*ئەگەر منداڵەکەی بینی سەربڕاوەو برژاوە منداڵەکە تەمەنی دەگات بەئاستی تەمەنی پیاو، ئەگەر کەس‌وکارەکەی لەگۆشتیانخوارد خێروچاکەی دەگات پێیان.

*ئەگەر فەرمانڕەوایەکی بینی پیاوێك سەردەبڕێتو سەریدەکات بەملی خەوبینەرەوە فەرمانڕەواو دەستەلاّتدار زوڵمو ستەمدەکەنو داوای کارێکی لێدەکەن ناتوانێت ئەنجامیبدات یاخود داوای ماڵو سامانێکی زۆری لێدەکەن بەئەندازەی قورسی سەربڕاو ، ئەگەر ناسیەوە خۆیەتیی، ئەگەر نەیناسیو پیرێکبوو هاوڕێیەکی دەیگریّو غەرامەو پارەی بەئەندازەی قورسی ئەو سەرە لێدەسێنێت، ئەگەر لاوێکبوو غەرامەو پارەی لێوەردەگریّ، ئەگەر سەربڕاو سەری لەگەڵدابوو پێوەی بانگدەکریّ بەلاّم غەرامە ناکریّ ئەوجا غەرامەکەی دەکەوێتە ئەستۆی خاوەنەکەی بەلاّم ئەرکو غەمو پەژارەی دەستدەکەویّ.

*پیاوێك هات بۆلای (ئیبن سیرین)و وتی: ژنێکم بینی سەر بڕابوو لەناوەڕاستی ماڵەکەیدا هەڵدەبەزیەوە لەسەر جێگەکەی ، ئنجا (ئیبن سیرین) پێی وت: دەگونجێت ئەو ژنە لەسەر جێگەکەی ئەمشەو مارەکرابێت، پیاوەکەش برای ژنەکەبوو مێردەکەشی دیارنەبوو، ئنجا پیاوەکە لای (ئیبن سیرین) هەڵساو توڕەبوو لەخوشکەکەی شەڕی بۆ هەڵگرتبوو لەناخیدا هات بۆ ماڵی خوشکەکەو کەنیزەکی خوشکی دیاریو خەلاّتێکی بۆ هێناو وتی: گەورەم دوێنیّ لەسەفەر گەڕایەوە ، ئنجا پیاوەکە رووی گەشبووەوەو توڕەیی نەما.

*ژنێك هات بۆ لای (ئیبن سیرین)و وتی: لەخەودا بینینم مێردەکەمم کوشت لەگەڵ کۆمەڵێکدا، (ئیبن سیرین) وتی: تۆ مێردەکەت ناچارکردوە لەسەر گوناهو تاوان، لەخوابترسە ، ئەویش وتی: راستدەکەی.

*یەکێکیتر هات بۆ لایو وتی: لەخەودا بینیم منداڵێکم کوشتو برژاندم، ئەویش وتی: ستەمو زوڵم لەو منداڵە دەکەیت بەوەی بانگیدەکەی بۆ

کـــارێکی نابـــەجێو ئـــەویش بەگوێتدەکات.
(نابلسی) دەڵێت: سـەربڕین لەخـەودا ستـەمو زۆرداریـیـە، ئـەوەی ببینـێ سەربڕاوە پەنابگرێت بەخوا.
*ئەگـەر کۆمـەڵو نەتەوەیـەك ببینـێ سـەربڕاون بەڵگـەی خێـرە لەسـەر تەواوبوونی کارو بارەکانی خەوبینەر.
*ئەگـەر لەخـەودا بینـی یـەکێکیتر سـەریدەبڕێ بەڵگەیـە لەسـەر تـەواوی کاروبارەکانی بەڵام ئەم خێراترە.
*ئەگـەر یـەکێك بینـی سـەردەبڕێ بەدەستی یـەکێکیتر سـەربڕاو خێـری لەسـەربڕ دەسـتگیردەبێت، ئەگـەر زینـدانیبوو ئـازاد دەکـرێ، ئەگـەر تاسـابوو دڵنیادەبێـت، ئەگـەر دیلبـوو ئـازاد دەکـرێ ، ئەگـەر مـیرو فـەرمانڕەوابوو دەسـتەڵاتو فەرمانڕەوایی زیاد دەکات.
*ئەگـەر بینـی مرۆڤێـك سـەردەبڕێت سـتەمی لێـدەکات هەمووشـتێکیش حەڵاڵنەبێت سەربڕینی بەو شێوازەیەو، بکەر ستەم لەکارلێکراو دەکات.
*ئەگەر هەندێك لەخزمـەکانی سـەربڕی پلەوپایـەی خزمایـەتیو رایەڵـەکانی فەرامۆشدەکات.

*ئەگـەر غـەمو پـەژارەی هـەبێتو لەخـەودا بینـی سـەریدەبڕن غـەمو پەژارەکەی دەڕەوێتەوە.
*سەربڕین مارەبڕینە.
*ئەگـەر ژن سـەربڕێت لەحەمامـدا بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری.
*ئەگەر لەدواوە زیندەوەرێك سەربڕێت لەدواوە دەچێتە لای ژنەکەی.
**سەرپێچی:** (نابلسی)دەڵێـت: بۆیـەکێك رقی لێبێت دابەزاندنی سزایە.
**سـەرتاش:** (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: پیاوێکـە کاروبـاری خـەڵکی لای فەرمانڕەوا چاکدەکات.
**سەرتاشـین ( قـژبڕین ):** (نابلـسی) دەڵێت: ئـەوەی لەخـەودا سەریتاشـی دەگەڕێتـەوە بـۆ سروشـتی خەوبینـەر لەکاتی بەئاگاییو بێداریدا.
*ئەگـەر بینـی سـەری دەتاشـێ لەمامەڵەو ساماندا زەرەر دەکات .
*ئەگـەر سەرتاشـینەکەی لـەوەرزی هاوینـدابوو سروشـتی بەچەشـنێکی تایبەتبوو سوودو قازانجی پێدەگات.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پـشوو و چـاکبوونەوە لەنەخۆشـی سەرئێـشەو چاوئێشە.

*ئەگەر قژی بینی بڕاوە لەوەرزی زستاندا دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شوێنی سەرتاشین و کارەسات و زەرەر.

*سەرتاشین ئەمانەت سپێرییە لەگەڵ دڵنیابوون لەترس وبیم.

*هەروەها کورتکردنەوەو تاشینی لە(حەج)دا قەرزدانەوەیە، هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت، هەروەها قژ کورتکردنەوە دڵنیابوونە لەترس وبیم.

*ئەگەر بەدەر لەکاتی(حەج) قژی تاشی لەچاکێتی لەخواردنەوەوە پێدەگات، ئەگەر خاوەنەکەی لەناڕەحەتی و دەردەسەریدابوو یاخود قەرزاربوو خوداوەند دەرووی لێدەکاتەوە.

*هەروەها وتراوە: ئەگەر لەکاتی خۆیدانەبوو دەوڵەمەندبوو هەژار دەکەوێت، ئەگەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئاشکرابوونی نهێنی و لابردنی گەورەو سەرکردەکەی بەفێڵ یاخود مردنی.

*ئەگەر کەسێکی یەکلابوو شکۆمەندی و کەسێتی خۆی لەدەستدەدات.

*ئەگەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە.

*ئەگەر دەوڵەمەندبوو ماڵ و دارایی کەمدەکات.

*ئەگەر بینی سەری تاشیوە زەفەر بەدوژمنەکانی دەهێنێت و دەبێت بەخاوەن هێزو شکۆمەندی.

*ئەگەر بینی وەك ئەوەی قژی دەبڕێت لەشکۆمەندی و ڕێزو حورمەتی دادەبەزێت.

*ئەگەر بینی سەری دەتاشێت نەخۆشدەکەوێت.

*ئەگەر بینی بڕیویەتی باشە بۆ یەکێك سروشت و خودی وابێت.

*ئەگەر بینی بەدەستی خۆی قژی دەتاشێت قەرزەکەی دەداتەوە.

*ئەگەر بینی قژی هاوسەرەکەی بڕاوە تەلاقیدەدات یاخود دەمرێت و لێی جیادەبێتەوە.

*ئەگەر ژنێك بینی مێردەکەی قژی کورتدەکاتەوەو پاشان سەری دەتاشێت زیندانی کردنیەتی بەدەستی مێردەکەی لەماڵەکەی خۆیدا، هەروەها وتراوە ئەگەر سەر بتاشێت نهێنی دەدرکێنێ.

*ئەگەر قژتاشینەکەی قسەی باشی تێدابوو لەگەڵ قەرزدانەوەدا ئەمانەت ئەسپەردەدەکات.

*ئەگەر بینی مرۆڤێك بانگیدەكات بۆ قژبڕین مێردەكەی ژنانیتر بەنهێنی بانگدەكاتو ئاژاوە دەكەوێتە نێوانیان.

*ئەوەی پەلكی ژنەكەی بەبڕاوی ببینێ هەرگیز كوڕی نابێت.

*ئەگەر قژی ببڕێت هێزو توانای لاوازدەبێت.

*ئەگەر بینی نیوەی ریشی تاشراوە هەژاردەكەوێتو شكۆمەندی لەدەستدەدات.

*ئەگەر لاوێكی نادیار بیتاشێت لەسەر دەستی دژومنێكی ناسراو یاخود هاوچەشنی ئەو دوژمنەوە دەڕوات.

*ئەگەر پیاوێكی پیرو بەتەمەنبوو شكۆمەندییەكانی لەسەر دەستی پیاوێكی بەدەستەلاتی بێ رەچەڵەك لەناودەچێت.

*ئەگەر بینی قژی بڕا رووخساری پیردەبێت لەبژێوی پەیداكردنو هەوڵداندا.

*تاشین ئاسانترە لەهەڵكێشان، دەگونجێت باشبێت بۆ هەندێك لەكاروبارەكانیدا ئەگەر رووخسارو دەمو چاوی ناشیرین نەكات بەلاَم ئەو باشییە قورسو گراندەبێت لەسەری.

*ئەگەر پڕ بەچنگی گرتیو بەو ئەندازەیە بڕی پیاوێكە مالَو سامانەكەی پاك رادەگرێت.

*ئەگەر بینی چنگیكردوە بەڕیشی مامیدا قەرزیدەداتێ هەتا لەبندەریدەهێنێتو میراتی مامی دەخواتلەوە زیاتری پێنابڕێت، ئەگەر بەشێكی لێبڕی بەو ئەندازەیە میراتی وەردەگرێت.

*ریش تاشین بەسەرچوونو رۆینی مالَو شكۆمەندییە.

*وتراویشە ریش تاشین فێلَو قۆڵبڕینە یاخود بەلاَو ئافەیە دێت بەسەر كشتوكاڵدا یان هەڵكێشانییەتی بەر لەوەی سەرهەڵبدات یا مردنی كوڕەكەیەتی یا ژنەكەی لەناكاو.

*ئەگەر بینی سەریدەتاشێ هەروەك چۆن بەبێداری دەیتاشێو حەز بەوە بكاتو لەنێو خەڵكیدا بڕوات دەوڵەمەند دەبێت بەهۆی منالەكانیەوە ئەگەر كەسێكبوو قژی درێژدەكردەوە نەیدەتاشی ، ئەگەر لەجەنگدابوو دیلدەكریێو دەكوژرێت، ئەگەر لەكاتی ئاشتیدابوو مالَو داراییەكەی بەسەردەچێتو نهێنی ئاشكرا دەبێتو لەگەورەو فەرمانڕەواكەی جیادەبێتەوە.

*هەروەها دەلێن: ئەگەر یەكێك بینی لەجەنگو غەزادا سەریدەتاشێ لێخۆشبوونە لەگوناهەكانیو

برژادنـــەوەی قەرزەکانیـــەتی لەگـــەڵ ڕەواندنـــەوەی غەموپـــەژارە، ئەگـــەر سەرتاشـــینەکە لـــەوەرزی زســـتاندابوو لەپلەوپایـــەدا شکـــستدەخواتو مـــاڵو داراییەکـــەی بەفیڕۆدەچـــێت، ئەگـــەر دایکـــی هـــەبوو دەمرێـــت، ئەگـــەر کوڕداریش بێت هەر بەوچەشنەیە.

*ئەگـــەر ژنێـــك بینـــی قـــژی دەبڕێـــت بەڵگەیـــە لەســـەر مردنـــی خـــۆی یـــا مێردەکەی یاخود بەدەرکەوتنی نهێنیو پـــەنهانی ، یـــاخود خێروچـــاکەیەکی لەلایەن مێردەکەیەوە دەستدەکەوێت.

*ئەگەر بینـی سمێڵی تاشراوە یاخود کورتکراوەتـــەوە خێـــرو چـــاکە ڕووی تێدەکات.

*ئەگـەر بینـی سـەرو ریـشی تاشـراوە ئەگـــەر نەخۆشـــبێت چـــاکدەبێتەوە، ئەگەر قەرزاربێت قەرزەکەی دەداتەوە، غـــەمباریش غـــەمو پەژارەکـــەی دەڕەوێتـــەوە ، هـــەروەها دەڵـــێن: لەخەودا باش نییە.

*ئەگـەر بینـی پێـشەسەری دەتاشـێ قـەرزاری تیایـدەباتو کەسـیش پێـی نازانێت.

*ئەگـەر بینـی مـووی سـکی دەتاشـێ خوداوەنـد هۆکـارێکی بـۆ دەسـازێنێ قەرزەکـەی بداتـەوەو کاروبـاری خـۆی پێڕێکبخات.

*ئەگـەر بینـی قـسڵدەگرێتەوە مـووی پێـشی عـەورەتی پـێ لادەبـات ئەگـەر دەوڵەمەندبێت ماڵو دارایی تیادەچێتو ئەگەر هەژاربێت دەرووی لێدەکرێتەوەو دەوڵەمەنـدبێت ، بـەلأم ئەگـەر نیـوەی بردو نیوەی نەبرد هەنـدێك ناڕەحـەتیو چەرمەسەری دەڕەوێتەوەو هەنـدێکیش دەمێنێتـــــەوەو مـــــاڵو دارایـــــی لەدەسـتدەداتو بەشـێکی کـەمی بـۆ دەمێنێتەوە.

*ئەگـەر بینـی مـووی پێـشی بـەمووس دەتاشێ لەلایەن هاوسەرەکەیەوە خێرو چـاکە ڕووی تێـدەکات بـۆ ژنـیش بەهەمان شێوەیە.

**سـەرتوێژ فـرۆش:** (نابلـسی)دەڵێـت: لەخـــەودا پیـــاوێکی دڕندەیـــە لـــەنێو خەڵکیدا فیتنەیی دەکاتو دەمەدەمـەو سـەوقاتی بلأودەکاتـەوە هـەتا خـۆی سوودمەندبێ.

**سەرجل(کەوا ):** (ئیبن سـیرین) دەڵێت: دەرکـەوتنو هێـزو دەسـتەلأتە لەگـەڵ دەرووی خێـــرو، ســـفتو لووســیـــشی باشترە.

*ئەگـــــەر ســـــەرجلێکی ئاوریـــــشمی بەخۆیـــــــەوە دی دەســـــــــتەلأت

بەدەستدەهێنێ بەئەندازەی هێزو توانای سەرجلەکە بەلام خواردنی زیانێکە لەئایندەکەوێ.

* ئەگەر لەجەنگدا لەبەریکرد لەگەڵ چەکدا زیانی نییەو بۆخاوەنەکەی دەستەلاتو دەروە لەهەموولایەکەوە.

**سەرچاوەی ئاو:** (نابلسی) دەڵێت: سەرچاوەی ئاو نیعمەتو خێرو فەرو گەیشتنە بەئومێدو هیوا ئەگەر خاوەنەکەی حاڵوباری باشبوو.

* ئەگەر چەن سەرچاوە ئاوێکی بینی تەقیو دەرکەوت لەماڵی خۆیداو خەمی داپۆشراونەبوو بەلاو نەهامەتییەك رووی تێدەکاتو ئەندامانی خانەوادەکەی دەگرین.

* ئەگەر بینی دەستنوێژدەگرێ لەسەرچاوە ئاوێك خێرێکی تەواو دێتە رێی ئەگەر سازگاربێت یان لێڵ.

* ئەگەر بینی لەماڵەکەیدا یاخود جێگەیەك کەزیانی پێدەگەیەنێ ئاو هەڵقوڵاو لەماڵەکەهاتە دەرەوە بژێویو خێرو نیعمەتی دەستگیردەبێ، ئەگەر لەماڵی خۆیدا هەڵقوڵا غەموپەژارەیە لەلایەن ژنەوە تووشی دەبێ، ئەگەر لەدیوارێك هەڵقوڵابوو غەمو پەژارەیە تووشی دەبێت لەلایەن پیاوێکی ئەوماڵەوە وەك برا یان زاوا یاخود هاورێ.

* ئەگەر ئاوەکە هەڵقوڵا هەتا هەمووی رۆیی لەغەمو پەژارە بەخێرایی قوتاردەبێ، ئەگەر ئاوەکە نەهاتەدەرەوە خەمێکە دەمێنێتەوە، ئەگەر سازگاربوو غەموپەژارەیە لەگەڵ لەشساغیدا.

* سەرچاوەی ئاوی لێل باش نییە لەگەڵ ئەو ئاوەی لەبەرینەروات.

* ئەگەر ئاوێکی بینی لەبەریدەروات ئەگەر خاوەنەکەی زیندوو یا مردووبوو لێکدانەوەی لەکاروکرداریدایە لەرۆژی قیامەتدا.

* ئەگەر ئاوێکی بینی هەڵقوڵا لەگەرەکەکەیان یان لەماڵەکەیانو رژا یان لەبەری نەرۆیی غەمو پەژارە لەوێدا بلاودەبێتەوە ، هەروەها ئەگەر لەئاوی سەرچاوەیەکی خواردەوە غەمو پەژارەیە، ئەگەر ئاوەکە لێڵبوو غەموپەژارەکە سەختو گرانە.

* هەروەها دەڵێن: ئەگەر سەرچاوە ئاوێك هەڵقوڵا لەماڵەکەی خۆی یان لەشوێنێکدا خزمەتکارێك دەگرێ.

ئەگەر سەرچاوەیەك ئاو لەزەویدا هەڵقوڵا خەڵکی ئەو شوێنە ماڵو سامانو بەروبوومی زۆر بەدەستدەهێنن

لەگەڵ پیسی و تێکچوونی سەرچاوەئاوەکە.

*ئەو ئاوەی لەشاخ و دۆڵەکانەوە هەڵدەقوڵێ ئەگەر سازگاربوو بەڵگەی خێرە بۆسەرجەم خەڵکی بەتایبەت نەخۆش و هەژاران و بەڵگەیە لەسەر ئاسانی و چاکبوونەوە چونکە هیچشتێك لەئاو خۆشتر نییە، ئەگەر بینی وشکیکردەوە بەپێچەوانەوە بۆ سەرجەم خەڵکی بەڵگەیە.

*ئەگەر یەکێك لەئاوی سەرچاوەیەك دەستنوێژی گرت ئەگەر غەمباربوو خوداوەند دەرووی لێدەکاتەوەو ئەگەر ترسابوو دڵنیادەبێ یان نەخۆشبوو چاکدەبێتەوە یاخود قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە ، ئەگەر گوناهباربوو خوداوەند لەسەرجەم گوناهەکانی خۆشدەبێ.

*ئەگەر ئاوێکی سازگاری بینی ژیانە بۆیەکێك ببێت بەخاوەنی، ئەگەر بینی بەنێو ماڵاندا دەڕوات ژیانی گشتییە.

*ئەگەر ئاوێکی بینی دەچوە نێو ماڵەکەی بەکونێکدا کەوا کەسێك دەیتوانی بەدەست بیگرێت رزق و رۆزییە رووی تێدەکات.

**سەرخۆشی( مەستی )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: سەرخۆشی بەبێ مەیخواردن خەم و پەژارەو بەلاو نەهامەتیە بەپێی: ﴿وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى﴾ (الحج: ٢).

*سەرخۆشبوون بەهۆی مەی و بادەوە ماڵ و دەستەلاتە خەوبینەر بەدەستیدەهێنێت.

*سەرخۆشی بەهۆی مەی و بادەوە دڵنیاییە لەترس و بیم چونکە سەرخۆش لەهیچ شتێك ناترسێ.

*ئەگەر بینی سەرخۆشبوە، جل وبەرگەکەی پرزۆڵ و لەت لەتبوە پیاوێکە ئەگەر دنیا دەروازەکانی بۆ بکاتەوە خۆی راناگرێت.

*ئەوەی ببینێ بادە دەخواتەوەو سەرخۆشیش دەبێت ماڵ وسامانی بەحەرام بەدەستدەکەوێت و بەو ماڵەوە دەستەلات بەدەستدەهێنێت بەئەندازەی سەرخۆشیەکەی.

*هەروەها دەڵێن: سەرخۆشی بۆ ژن و پیاو خراپەو بەڵگەیەلەسەر نەزانینێکی زۆر.

*پیاوێك لەخەودا بینی دەستەلاتێکی پێ سپێرا لەکارەکەیدا هاوەڵایەتی کۆمەڵێکیکرد ویستی بڕوات بەسەرخۆشی هەموویانی بەدیکردو

نەیتوانی زاڵببێت بەسەر کەسیاندا، ئەمەی گێڕایەوە بۆ (ئیبن سیرین)و ئەویش وتی: ئەوانە دەمرنو سوودت پێناگەیەنو وەلامیشت نادەنەوە.

*بینینی مەی لەمەرکانەدا بەدەستهێنانی گەنجو دارایییە.

(نابلسی)دەڵێت: سەرخۆشی دەوڵەمەندییە لەگەڵ رێگرتن لەوەی لەخۆی باببێت. ئەگەر سەرخۆشیەکە لەبادەی ترێبوو دەستەلاتو فەرمانڕەواییە بەهەموو شێوەیەك.

*سەرخۆشی بەڵگەی خێرو چاکەیە بۆ یەکێك بترسێ.

*سەرخۆشبوون بەبێ مەی بەڵگەیە لەسەر بانگەشەکردنی حاڵێك کەتێدا نییەو ناتوانێت ئەنجامیبدات، دەگونجێت رووداوێك رووی تێبکات، گرنگ بێت لەلای تا بەمەستی دەگەڕێتەوە لێی ، ئەگەر چاکەکاربوو مەستە بەخۆشەویستی خوداوەند.

**سەرد**[1]: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی دووڕوو دووڕەنگەو باش نییە لەقسەدا ساردو سڕەو وتەکانی زبرو رەقن.

[1] **صرد**: باڵندەیەکە سەری گەورەیەو ژێرسکی سپییەو سەرپشتی سەوزەو پەلەوەری بچووك راودەکات (فەرهەنگی دەریا: ١/٥٥٧).

**سەردانی پێغەمبەر(ﷺ) لەخەودا:**

بەڵگەیە لەسەر خۆنزیککردنەوە لەپەروەردگار بەکاروکرداری چاك.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+دڵنیابوون لەترسو بیم.

+نزیکی لەگەورە پیاوانەوە.

+پلەوپایە بەرزی.

+رووکردنە زاناو پلەدارانو دڵسۆزی بۆ خانەوادەی پێغەمبەر(ﷺ)و خۆشویستنی ئەوەی خۆشی دەوێن.

+ئارەزووداریو زانیاریو رێنومایی.

*هەروەها سەردانی (قودس) لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەرەکەتو شارەزابوون لەزانیاریو نهێنی، سەردانی حەزرەتی (ئیبراهیم) (سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەیە لەسەر گوێڕایەڵی باوكو دایكو چاکەکردن لەگەڵیانو خۆشیرینکردن لایان بەوتەوکرداری بەرز.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەوڵدان لەبەدەرخستنی زانیاریدا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆشەویستی بۆ خەڵکی خێرۆمەندو گوێڕایەڵیو هاتنەدی ئاواتەکانی لەدنیاو قیامەتدا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆشویستنی خەڵکی خێرۆمەندو گوێڕایەڵیو ئومێدەواربوونی خێری دنیاو قیامەت.

**سەرڕووتانەوە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ماڵێکە لەلایەن سەرکردەیەکەوە هیچ سوودێکی لێوەرناگیرێ‌و سوودی نییە بەماندوبوون‌و هیلاکی نەبێت.

*بینینی سەرڕووتاوە ساڵێکی قات‌و قرییە.

**سەرزەنشت(گلەیی - لۆمە):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سەرزەنشت بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی.

*ئەگەر بینی گلەیی‌و سەرزەنشتی خۆیدەکات کردارێکدەکات لێی پاشگەزدەبێتەوە یان سەرزەنشت دەکرێ لەسەری بەپێی ئایەتی: ﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا﴾(النحل: ١١١).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا لەلایەن پێغەمبەر یان بەرپرسێکەوە سەرزەنشتکرا بەڵگەیە لەسەر تەوبەو گەڕانەوەی لەسەرگەردانی.

**سەرسامی (سەرسوڕمان):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: سەرسامی لەهەموو ئاینەکاندا نکوولییە، ئەگەر بینی سەرسامەو هیچ ئاینێکی نییە سەرجەم دەروازەکانی داوای لێدادەخرێ‌و خوازو ئاواتەکانی لێدەگیرێ‌و هیچ ویست‌و خوازێك بەدەستناهێنێت.

(نابلسی)دەڵێت: سەرسامی بەڵگەیە لەسەر بێئاگایی‌و پەلکێشکردنی لەلایەن شەیتانەوە بۆسەرگەردانی.

**سەرشان:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پشت‌و پەناو قیزەو ژنێکی شۆخ‌و شەنگ‌و جوانە.

*ئەگەر بینی دەیدات بەخۆیداو دەنوێت ژنێك دەهێنێت.

*ئەگەر دووچەرخە (پاسکیل)ێکی گەوهەرداری بینی ژنەکەی قورئان لەبەر دەکات.

**سەرقاڵی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر خۆی بەسەرقاڵی بینی کچێك دەهێنێ‌و سەرقاڵیدەکات هەروەك قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ﴾ (یس :٥٥) دەڵێت: شکانی شقڵی کچێنییە.

(نابلسی) دەڵێت: سەرقاڵبوونی مرۆڤ لەخەودا بەکارێکیتر ئەگەر بەسیبوو بەڵگەیە لەسەر نوێکردنەوەی رزق‌و رۆزی‌و هاوسەرگیری‌و منداڵ‌و بەندایەتی.

**سەرقۆڵ:** (نابلسی)دەڵێت: سەرقۆڵی مرۆڤ لەخەودا بەماڵ‌و سامان لێکدەدرێتەوە، سەرقۆڵی گوشادو بەرین فراوانی ماڵ‌و سامانە.

*دڕاندنی سەرقۆڵ هەژاریو نەبوونییە هەروەها نەمانی نازو نیعمەتە.

**سەرکار( بەڕێوەبەر):** بینینی سەرکاری ئاژەڵ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی سەرکردەی خاوەن ماڵو بەڕێوەبەرن.

*سەرکار هیچ خێرێکی تیا نییە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+هاوەڵێك.

+نووسەری گرێبەستی هاوسەرگیری.

+دەویت.

**سەرکردەی سوپا:** (نابلسی) دەڵێت: پیاوێکی بەناوبانگە باکی نییە ئەگەر سەربازەکان هەڵیبگرن.

*ئەگەر بینی سەرکردەی سەربازەکانە خێروماڵو داراییو شکۆمەندی دەستگیردەبێت ئەگەر شایستەی ئەوەبێت بەڵام ئەگەر شایستە نەبێت بەڵگەیە لەسەر مردنی، ئەگەر هەژاربێت بەڵگەیە لەسەر بشێویو دەنگبەرزکردنەوەی بەسەر خزمەتکاراندا.

**سەرکەوتن بەئاسمانا:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی سەرکەوت بەسەر شاخێکدا بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو سەفەر، ئەگەر سەرکەوت بەئاسمانا هەتا گەیشت بەئەستێرەکانی ڕێزو پلەوپایە بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی کاتێ پێیدا سەرکەوتبوو بەئەستێرەو ڕێنومایيکرا پلەوپایەو سەرۆکایەتی بەدەستدەهێنێت.

*دابەزین دوای سەرکەوتن پێیدا ملکەچیو رسواییو سەرشۆڕییە، هەروەها دەڵێن: بەدەستهێنانی نازو نیعمەتی دنیایە لەگەڵ پلەوپایەی ئایندا.

*ئەگەر بینی لەشاخێکەوە دابەزی خۆشیو شادی بەدەستدەهێنێت.

*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر گۆڕانی کاروبارو بەدەستنەهێنانی ویستوخواز.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا سەرکەوتن واژووی دابەزینە، ئەوەی بەرزبێتەوە بەئەندازەی بەرزبوونەوەی دادەبەزێ ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چەوسانەوەی دەروونی، بەرزبوونەوەش بەرزییەو دابەزین نزمیو سووکییە.

*ئەگەر سەرکەوت بەسەر کۆسپێکی بەرزدا بەرزبوونەوەیە بەماندوویەتیو شەکەتبوون.

*ئەگەر بینی سەرکەوت بەسەر شاخێکدا ئەو شاخە مەبەستو خوازەو بەئەندازەی ئەوەی دەیەوێت بەرزدەبێتەوە.

*هەموو بەرزبوونەوەیەك مرۆڤ ببینێ بەشاخدا یان هەورازێکدا یاخود هەرشتێکیتر ویستوخوازی بەدەستدەهێنێ لەپێداویستیەکانی بەرزبونەوەی ڕێکیش ناڕەحەتییەو خێری تێدا نییە.

**سەرگەردانی ( لادان ـ وێڵی ):** (نابلسی) دەڵێت: لادان لەڕێگەی ڕاست بەڵگەیە لەسەر لادان لەحەق و ڕێنومایی، بەڵام ئەگەر ڕێگەکە خواربوو لادان لێی لادانە لەخراپەو داواخوازی ڕێنومایی و جێگیربوونە.

*ئەگەر بینی لەڕێگە لایدا ڕوودەکاتە ناحەق، ئەگەر ڕێگەی ڕاستی دۆزییەوە ڕێگەی سەرفرازی دەیوەتەوە.

**سەرما:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر مرۆڤ لەخەودا هەستی بەسەرما کرد هەژارییە.

*ئەوەی لەسێبەردا سەرمایبوو نەیتوانی لەبەر تیشکی خۆرا دابنیشێت هەژاری بەسەر دەچێت، هەروەك چۆن ئەگەر لەبەر تیشکی خۆردابوو ڕوویکردە سێبەر لەخەم و پەژارە قوتار دەبێت.

*سەرما لەخەودا ئەگەر خەوەکە لەوەرزی هاویندابوو بەڵگەیە لەسەر سوودو ڕزق و ڕۆزی و پۆشاکی گرانبەها.

*ئەوەی ببینێ سەرمایەتی و دواتر ڕەشەبایەك هەڵبکات بەسەریدا هەژاری پترو زیاد دەکات، ئەگەر چوەپاڵ ئاگر یان پشکۆو دوکەڵ هەژاردەکەوێت و پاشان لەکاروباری فەرمانڕەوادا هەوڵدەدات و کارەکەشی مەترسیدار دەبێت، ئەگەر پشکۆبوو دەست بۆ ماڵی هەتیو دەبات، ئەگەر خۆی گەرمکردەوە بەدوکەڵ بەڵاو نەهامەتیەکی گەورە ڕوودەکاتە دەرووني.

*هەندێك دەڵێن: سەرمایەکی سەخت لەکاتی خۆیدا بەڵگەونیشانە نییە لەسەر هیچ شتێك بەڵام ئەگەر لەکاتی خۆیدا نەبوو بەڵگەیە لەسەر سەفەری گەشتیار کەڕوونادات و بەڵگەیە لەسەر بەدەرکەوتنی شتە نادیارو پەنهانەکان.

**سەرنشینانی لانەو ماڵی فەرمانڕەوا:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر :

+سەفەرو جموجووڵ لەوشکانی و ئاودا.

+چاکبوونەوە لەنەخۆشی و بەڵاو نەهامەتی.

**سەرۆکایەتی:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا دەویتی دەکات بەڵام ژنە سوزانیەکانی نەدی ئەوە پیاوێکی دەڵاڵەو شتومەك و کاڵا دەخاتەڕوو بەهۆیەوە دەژی.

*سەرۆكایەتی گەواهیدانی ناحەقە، ئەگەر بینی گەواهی ناحەق دەدات دەویتی دەدات.

**سەرەتان**[1] : (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێكی شانو شەوكەتدارو بەهێزە، خواردنی گۆشتەكەی سوود وەرگرتنە لەماڵو سامانو لەزەوییەكی دوورو چەپەكدا.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی بیبینێ ماڵێكی حەرام بەدەستدەهێنێت.

**سەرهەڵدان** : (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر شتێكی شاراوەی تیادەركەوت بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی دوای نارەحەتیو سوودو قازانج دوای زیان یاخود بوونی كوڕێك دوای نائومێدی.

*هەموو شتێك كاتو وادەیەكی دیاریكراوی هەیە بینینی لەكاتێكدا بەڵگەیە لەسەر:

+بەجێهێنانی بەڵێن.

+بەدەستهێنانی پێداویستی.

+قەرزدانەوە.

+گەڕانەوەی كەسێكی ئاوارە.

+ئازادبوونی زیندانی یان منداڵبوونی دووگیان.

*دەگونجێت شتێك گەر لەكاتی خۆیدا نەبێ بەڵگەبێت لەسەر قەرز.

[1] **سەرەتان**: گیاندارێكی ئاوییە. (وەرگێڕ)

**سەرهەنگ** : (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر مژدەو سەركەوتن بەسەر دوژمناندا بەپێی ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ أَخَذَ اللهُ مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُم اثْنَي عَشَرَ نَقِيبًا﴾ (المائدة: ١٢).

**سەری جالووت** : (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر سەری جالوتی لەخەودا بینی خراپەكاری فێڵباز بانگی خەڵكیدەكات بۆ ناپاكیو فرۆفێڵ.

*ئەگەر بینی سەری جالووت ناو زەد دەكات رقی لەكارو پیشەكەیدەبێت ناپاكیو فرۆفێڵی لەگەڵدەكریو خۆشی پاكو بێتاوانە.

**سەرین** : (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا هاوسەرو ماڵو سامانی پارێزراوو هاوڕێیەتیە یان نهێنیە لەگەڵ پشوودان لەماندوبوونو هیلاكی.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: سەرینی بەرز خزمەتكارەكەیەتی، هەندێكدەڵێن: منداڵە یان زانا بەلام جێگەی راخراو بەڵگەیە لەسەر هاوسەر.

*دەگونجێت جێگە بەڵگەبێت لەسەر ئەو زەوییەی مرۆڤ تەپاوتلی تیادەكات بەبێئاگایی هەتا لەوێوە روو بەقیامەت دەكەوێتە رێ.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ژنێکی خزمەتکارە بۆ خاوەنەکەیو خزمەتی خەڵکی.

* ئەگەر سەرینی بینی بەڵگەیە لەسەر ژنێک نهێنی ژنێکیتر دەزانێو دایدەپۆشێ ، ئەگەر سەرینەکەی دزی خزمەتکار یان هاوسەرەکەی دەمرێ.

* ئەوەی لەسەریندا دەبینرێ لەدڕاندنو کۆنیو تیاچوون رووبەرووی خزمەتکار دەبێتەوە.

* هەروەها بۆ دەستەڵاتدار نووسەرو بەردەستو ئەوانەن کاروباریان پێدەسپێرێ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گەنجینەدارەکەی پشتی پێدەبەستێ بەئەندازەی ئەوەی خەوبینەر دەیبینێ.

* بۆ خەڵکی گشتی لەبراو هاوڕێ راڤەدەکرێ.

* پشتی بەفەرشو بەڕەو راخەر راڤەدەکرێو ئەو جوانیو قەشەنگییەی تیایدا دەبینرێ دەگەڕێتەوە بۆ خزمەتکارو بەردەستەکانی.

* ئەگەر بینی لەسەری دانیشتووە کیژێك دەهێنێ.

* ئەگەر بینی سەرینێکی هەڵگرتوە خێرو چاکە بەدەستدەهێنێ ، هەروەها دەڵێن: ئەو پشتییەی پاڵی پێوەدەدات غەمو پەژارەیە.

* هەروەها پشتی هاوسەرو هاوڕێ یان کوڕو دایکی بەسۆزو بەزەییە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پشوو یان نەخۆشی بۆیەکێکی لەشساغ.

**سەعوگ**[1] : (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی ئەو دەرمانە دەکاتە لووتی تووڕە دەبێت بەئەندازەی تەنگەبەری خشڵو بابەتەکانی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پێویستی بەخۆشەویستی یاخود ئەوەی روودەکاتە ئەقڵو ژیری مرۆڤ.

**سەفەر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سەفەر لەحالو بارێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ حاڵو بارێکیتر.

* ئەگەر بینی سەفەر دەکات زەوییەکدەماڵێ.

(نابلسی) دەڵێت: سەفەر لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی خووڕەوشتی خەڵکی، ئەگەر ئەوکەسەی سەفەر دەکات هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت، ئەگەر کەسانی موسافیر هاتن بۆ لای لەخەودا

---

[1] **سەعوط:** چارەسەرێکە دەکرێتە لووت هەتا بگات بەمێشكو پژمین لاببات.

(بڕوانە: النهایة: ٣٦٨).

دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو هەواڵانەی لەلایەن ئەوانەوە دەگات بەخەوبینەر.

*ئەگەر بینی سەفەر دەکات لەشوێنو جێگەیەکەوە دەچێت بۆ شوێنو جێگەیەکیتر گەڕانەوەو تەوبەو پاشگەزبوونەوەیە لەسەرپێچیو تاوان.

*هەروەها گەڕانەوە لەسەفەر بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی پێداویستی.

*ئەگەر بینی لەسەر قاچ سەفەر دەکات قەرزێکی زاڵە بەسەریەوە.

*ئەگەر بینی لەماڵو لانەیەکی نادیارەوە گواستیەوە سەفەردەکات.

*ئەگەر نەخۆشێك بینی سەفەر دەکات بۆ زەوییەکی دوور یاخود ڕوودەکاتە لانەیەکی نادیار یاخود لەماڵێکەوە دەچێت بۆ ماڵێکیتری نادیار بەڵگەیە لەسەر مردنی، ئەگەر بینی توێشووی سەفەری هەڵگرت روو لەخێرێکدەکات.

**سەفەرد**[1]: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ژنێکی دەوڵەمەندو بەڕێزو شۆخو شەنگەو ماڵو دارایی ئێجگار زۆرە، ئەوەی ببێت بەخاوەنی ئەم باڵندەیە ژن یا کچی ئاوای دەبێت.

**سەکباچە**[2]: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بەگۆشتی مەڕلێنرابوو و خواردی بەڵگەیە لەسەر دەستپاکیو تەواوی شکۆمەندی لەلای خەڵکی پایەدار.

*ئەگەر بەگۆشتی مانگا لێنرا خواردنی بەڵگەیە لەسەر ژینێکی خۆشنوودو بەدەستهێنانی ویستو خواز لەلایەکەوە.

*ئەگەر گۆشتی باڵندەلێنرا بازرگانیو دەستەلات بەسەر کۆمەڵێکی دەوڵەمەندی باسکراو بەئەندازەی چەورییەکەی بەدەستدەهێنێ.

**سەکۆ**: (نابلسی) دەڵێت: سەکۆ لەخەودا دەروولێکردنەوەیە بۆ غەمبارو غەمو پەژارەیە بۆ دڵخۆش بەتایبەت ئەگەر بۆ خۆشۆردن بەکار دەهێنرا.

**سەگ**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەلێکدانەوەی سەگدا جیاوازی هەیە هەندێکدەڵێن: کۆیلەیە، هەندێکیتر دەڵێن: پیاوێکی یاخی نەزانو توندوتیژە ئەگەر وەڕی ، سەگی ڕەشی عەرەبی دوژمنێکی لاوازی بچووکی کەم ڕێزەو دەڵەسەگیش ژنێکی سووکو نزمە، ئەگەر گازی لێگرت خراپە رووی

---

[1] **سەفەرد**: باڵندەیەکە بەنموونە دەیهێننەوە لەترسنۆکیدا. (وەرگێڕ)

[2] **سەکباچە**: شلەیەکە لەگۆشتو ترشی دروست دەکرێ. (وەرگێڕ)

تێدەکات، ئەگەر سەگێك جلەکانی دڕاند پیاوێکی سووك ئابڕووی دەبات.
*ئەگەر گۆشتی سەگێکی خوارد زاڵو سەرکەوتوو دەبێت بەسەر دوژمنێکدا ماڵو سامانی داگیرکردوە.
*خواردنی شیری سەگ لەخەودا ترس وبیمە.
*ئەگەر کاروفرمانێکی بەسەگ سپارد ئەوکات سەگ هاوڕێیەکە بەهۆیەوە سەرکەوتوودەبێت.
*سەگ بەلگەیە لەسەر پایەدان یان کەسێك خاوەنی بیدعەبێت.
*ئەگەر سەگێك گازی لێگرت ئەگەر هاوەڵایەتی بیدعەکاترێکی کرد فیتنەیە، ئەگەر دوژمنداربوو قسەو جنێوو سووکایەتی پێدەکات یاخود زاڵدەبێت بەسەریا.
*ئەگەر خزمەتکاری هەبوو ناپاکی لەگەڵدەکات، ئەگەر لەکاتی نەبوونیدابوو شتێکی لێدەستدەکەوێ ئنجا بەئەندازەی گەزتن ئازاری پێدەکات.
سەگ ژنێکی سووکە لەنێو کۆمەڵێکی خراپدا، توولەسەگ کوڕێکی ڕەشتاڵەی خۆشەویستە، توولە شکۆدارییە لەنێو خانەوادەو ماڵی خۆیداو سپێتی باوەڕیەتی.

*هەروەها دەڵێن: توولەی سەگ منداڵی دۆزراوەی پیاوێکی نەزانەو خزمەکانی هەموو لەزیناوە پەیدابوون.
*سەگ پیاوێکی کەودەنە، سەگی شوان ماڵو سامانە لەگەورەو بەرپرسەوە دەستیدەکەوێت.
*سەگ دوژمنێکی ستەمکارە.
*سەگی مامۆستا هاوەڵەکەی سەردەخات بەسەر دوژمنەکانیدا بەلام سووكو بێ نرخە.
*هەروەها دەڵێن: خاوەنی ئەم خەوە دەستەلاتو بژێوی پێویستی پێدەدرێ.
*هەندێکدەڵێن: سەگ لەلێکدانەوەدا بەلگەیە لەسەر:
+زەرەر.
+هەژاری.
+نەخۆش.
+دوژمن ، مەگەر لەشوێنێکدابێت سەگی تێدا بۆیاریو بازی دادەنرێ لەوێدا بەلگەیە لەسەر ژیانو تامو چێژو خۆشی.
*سەگی ئاویی داوایەکی بەتاڵە لەگەڵ بڕیارو فرمانێك بەجێنایەت، هەموو جۆرە سەگێك بەلگەیە لەسەر کەسی خراپو گەندەڵ.
*دەگێڕنەوە (ئەبوبەکری صدیق) (ڕەزای خوای لێبێت) لەخەودا ساڵی

ئازادکردنی (مەککە)ی دیوە بینیویەتی لەنێوان (مەککە)و (مەدینە)دا کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لە(مەککە) نزیکدەبێتەوە بەیاوەری هاوەڵانیو سەگێك پێیان دەوەڕێت کاتێ لێی نزیکدەبنەوە لەسەر پشتدەکەوێ، گوانەکانی شیریان لێدێت. خەوەکەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوەو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "سەگەکەیان رۆییو چاکیان مایەوەو بەهۆی پەیوەندی خزمایەتیەوە داواتان لێدەکەن کاتێ دەگەن پێیان ، ئەگەر (ئەبوسوفیان)ی کوڕی (حەرب)تان دی مەیکوژن".

*ئەگەر بینی بوە بەسەگ خوداوەند فێری زانیاریەکی مەزنیدەکات ، پاشان لێی وەردەگرێتەوەو بەپێی ئایەتی: ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا﴾ (الأعراف: ١٧٥).

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر سەگی چینی بینی تێکەڵ بەکۆمەڵێ لەعەجەم دەبێتو موسوڵمان نین.

*ئەگەر بینی سەگێکی گرت هاوەڵایەتی خزمەتکاراندەکاتو بەزۆری خۆشیدەوێن.

*ئەگەر بینی راو بەسەگ دەکات دەگات بەویستو خوازی خۆی.

*ئەگەر بینی سەگ دەکوژێ زاڵدەبێت بەسەر دوژمناندا ، ئەگەر بینی سەگی راو رووبەراوکردن دەچن بۆسەرجەم خەڵکی باشە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر رەفتارێك مرۆڤ ئەنجامیدەدات.

*ئەگەر سەگەکەی بینی لەراو گەڕایەوە بەڵگەیە لەسەر ترسوبیمو بێکاری.

*ئەگەر بینی خۆیکرد بەشاردا بەڵگەیە لەسەر بێکاری .

*ئەو سەگانەی پارێزگاری لەماڵ دەکەن بەڵگەیە لەسەر پاراستنی شتومەکی پیاو لەلایەن هاوسەرەکەیەوە، ئەگەر بینی نەخۆشە بەڵگەیە لەسەر نەخۆشیو زەرەو تیاچوونی هەندێك شتومەك.

*ئەگەر دەڵە سەگێکی بینینی دەوەڕی بەڵگەیە لەسەر زیان لەلایەن خەڵکی خراپەوە.

*سەگ بەڵگەیە لەسەر تا بەهۆی ئەو هەسارەیەی بەسەگ ناوزەدکراوە.

*هەموو جۆرە سەگێ بەڵگەیە لەسەر نەتەوەیەکی سووكو رسوا.

*سەگ بەمندالی پۆلیس لێکدەدرێتەوە، هەروەها سەگ دوژمنێکی لاوازە یان پیاوێکی رژدە.

*ئەگەر بینی سەگێك پێی دەوەڕێ لەمرۆڤێکی کەم رێز قسەیەکی ناخۆشدەبیستێ.

*ئەگەر بینی گۆشتی سەگی خوارد زاڵدەبێت بەسەر دوژمنداو ماڵو سامانی بەدەستدەهێنێ.
*سەگ بەڵگەیە لەسەر پاسەوان هەروەها بەڵگەیە لەسەر خاوەن بیدعە.
*خواردنەوەی شیری سەگ ترس‌و بیمە، سەگ هاوڕێیەو بەهۆیەوە سەرکەوتن بەدەستدەهێنێ.
*سەگ منداڵێك یان سواڵکەری دەرودووکارە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سووکی‌و رسوایی‌و نزمی دەروون وێڕای زۆری باشەی بۆ خاوەنەکەی‌و پاراستنی ماڵو منداڵی.
*دەگونجێت سەگ بەڵگەبێت لەسەر هەوڵدان لەدنیادا لەگەڵ پەسمەندە نەکردن بۆ رۆژی تەنگانەو پێویست.
*سەگی دەوری ران دراوسێیەکی باشی مشورخۆرە بۆ خانەوادە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەگ راگرتن یان هاوڕێیەتی لەسەر پووچ‌و بەتاڵو زەرەرکردن لەماڵداو پووچەڵکردنی کردار.
*هاوەڵایەتی سەگ بەڵگەیە لەسەر خۆشاردنەوە بەهۆی چیرۆکی (أصحاب الكهف).
*دەڵەسەگ ژنێکی پارێزگاریکارە لەمێردەکەی‌و فرە وەچەو نەوەیە.

*دەگونجێت سەگ بەڵگەبێت لەسەر بێباوەڕی‌و نائومێدبوون لەسۆزو بەزەیی خوایی‌و بەدرۆخستنەوە.
*بینینی سەگی (أصحاب الكهف، هاوەڵانی ئەشکەوت) بەڵگەیەلەسەر:
+ترس‌وبیم.
+زیندانی.
+هەڵهاتن.
*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر نوێکردنەوەی دەستەڵات.

**سەلامی نوێژ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی سەلامدەداتەوەو لەنوێژ دەردەچێ دوای تەواوکردنی لەخەم‌و پەژارەکانی قوتاردەبێت.
*ئەگەر سەلامیدایەوە بەلای راستدا بەدەر لەچەپی بەڵگەیە لەسەر چاکبوونی هەندێك لەکاروبارەکانی، ئەگەر سەلامیدایەوە بەلای چەپیدا بەدەر لەلای راستی کاروبارو حاڵی ئاڵۆز دەبێت بەسەریەکدا.
(نابلسی)دەڵێت: سەلامدانەوە دوای تەواوبوونی لەنوێژ بەڵگەیە لەسەر شوێنکەوتن‌و سوننەتپارێزی‌و لێبوونەوە لەکارو سەفەرو رزق‌و رۆزی پەیداکردن.
*ئەگەر بەلای چەپدا سەلامیدایەوە بەرلەوەی بەلای راستیدا سەلامبداتەوە

بەڵگەیە لەسەر شوێنکەوتنی شەڕو خرایەو بیدعەخوازی ، ئەگەر لەنوێژەکەی تەواوبوو سەلامینەدایەوە بەڵگەیە لەسەر گرنگیدان بەدەستهێنانی سوودو قازانجو فەرامۆشکردنی سەرمایە.

**سەما :** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سەما غەمو پەژارەو نەهامەتییەکی هەراسانکارە، سەما بۆ نەخۆش بەڵگەیە لەسەر درێژخایاندنی نەخۆشی.

*هەروەها دەڵێن: سەمای هەژار دەوڵەمەندییەکە زۆر ناخایەنێت، سەمای ژنیش ئابڕووچوونییەتی.

*سەمای ئەوەی گەورەدارە بەڵگەیە لەسەر لێدانی، بەڵام سەمای زیندانی بەڵگەیەلەسەر قوتاربوون لەزیندانو کردنەوەی کۆتوبەندەکانی.

*سەمای منداڵ بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەمنداڵەکەی کەڕو لاڵە.

*سەمای ئەوەی بەنێو دەریادا دەڕوات کارێکی خراپو نالەبارە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر توندیو نارەحەتی کەرووی تێدەکات.

*ئەگەر مرۆڤ بۆ کەسێکیتر سەمایکرد بەڵاونەهامەتییەکی گەورە رووی تێدەکاتو هاوبەشدەبێت لەگەڵ سەما بۆکراودا.

*ئەگەر بینی لەنێو لانەوماڵی خۆی سەما دەکاتو کەسێکی نادیاریان لەگەڵدا نەبوو بۆ سەرجەم خەڵکی باشە بەشێوەیەکی هاوسەنگ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەوەی لەماڵو لانەکەی خۆی سەما بکات تێردەبێتو شادی دەیگرێ.

*ئەگەر نەخۆش سەمایکرد زۆر نیگەرانیو دوودڵی دەیگرێ، ئەوەی بەکێشبکرێ بۆ سەما قوتار دەبێت لەنارەحەتی.

*ئەگەر بینی ژنەکەی یا کوڕەکەی یاخود هەندێك لەخزمەکانی سەما دەکەن خێرو چاکەیەو بەڵگەیە لەسەر خۆشیو شادیو مەزنی.

**سەماکار( سوڕدەر ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا خاوەن بەڵاو نەهامەتییە ئەگەر سەمایکرد بۆخۆی سەما رووداني کاروبارێکەو بەرزبوونەوەیە.

*ئافرەتی سەماکار بەڵگەیە لەسەر دنیای پیسو گەندەڵو پشوودان لەماندوێتییدا.

*مەیموونی بازیو سەما بەڵگەیە لەسەر تەمێکاری هاوەڵپەیداکارو منداڵەکانیان.

**سەمتور( جۆرە سازێکە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لێدەری سەمتور پیاوێکی سەرکردەی خاوەن رەفتاری پڕوپووچە لەنێو هەژاراندا یان زیناکارو داوێنپیسە یاخود پارەپەیداکارە.

* ئەگەر دەستەلاتداریك بینی گوێبیستی سەمتور بوە گوێبیستی وتەی پیاوێکی پڕوپووچ گۆدەبێت.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+کاروباری خەڵکیو شتی پڕوپووچ.

+زیناوداوێنپیسی.

* یاریکردن بەشەترەنجو دامە.

+بەگەرخستنی جنۆکەو جادووگەریی.

* دەگونجێت لێدانی سەمتور ئامۆژگارکردن یان سەرزەنشت بێت.

**سەنج** [1]**:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەو سەنجەی لەزێڕ دروستدەکرێ بەڵگەیە لەسەر خۆشیەکانی ژیانو لێدانی شانازیکردنە بەدنیاوە.

(نابلسی) دەڵێت: سەنج لەخەودا پیاوی دنیاویستی خۆبەزلزانە.

* ئەگەر بینی بەسەنج لەدەرگاکەیدەدات دەستەلاتێك لای (عەجەمە)وە وەردەگرێ.

* سەنج ناخۆشیو مارەبڕینێکی خراپە یاخود پیاوێکی عەجەمییە.

**سەنگ ( مسقال )** [2]**:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپەو ئامۆژگاریو سەرزەنشت.

* هەروەها بەڵگەیەلەسەر رێنوماییو راستگۆییو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گوناهو تاوان.

**سەوزەفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەرپرسو پێشکەوتن لەکاروبارداو پۆلیسو بەرپرسی کاروباری خەڵکیو هۆکاری بەدەستهێنانیماڵو دارایی.

**سەوزی جلوبەرگ لەخەودا:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەموو سەوزییەك بەدەر لەسەوزی گەنمو جۆو کونجیو پاقلە ئیسلامە.

* ئەگەر بینی لەکێڵگەیەکی سەوزدا هەوڵدەدات لەکرداری چاکەو خواناسیدا هەوڵدەدات.

(نابلسی)دەڵێت: جلوبەرگی سەوز باشە لەئایندا چونکە جلوبەرگی بەهەشتیەکانە، ئەگەر جلوبەرگی سەوزی بینی بەڵگەیە لەسەر ئاینو

---

[1] **سەنج:** ئامرازێکی بەزمو شاییەو بەدوو پەنجە لێدەدرێت. (وەرگێڕ)

[2] **مسقال:** نزیکەی (٥)گرامە. (فەرهەنگی دەریا: ج٢/١١٨٨).

هێزو زیادەی بەندایەتی، لەگەڵ باشی حاڵوباری مردوو لای خوداوەند.
*پۆشینی جلوبەرگی سەوز بۆ زیندوو بەڵگەیە لەسەر مانەوەی میراتی بۆ مردووش بەڵگەیە لەسەرئەوەی بەشەهیدی لەدنیا دەردەچێت.
*هەموو جلوبەرگێکی سەوز سوودەو زیان ناگەیەنێت.
*هەروەها وتراوە: سەوزی لەجلوبەرگی ئاوریشمدا نەژن و نەپیاو پابەند نابن پێوەی.
**سەوڵی بەلەم:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زانیاریو بەڵگەنامەی راستو دروست.
**سەهۆڵ:** (نابلسی)دەڵێت: لەکاتی خۆیدا بریتییە لەغەمو پەژارە رەوینەوەو لووتشکانی ئێرەییبەرو دوژمنان.
*ئەگەر ئاو بەستیو دارو درەخت تیاچوو دەرگاکان داخران بەڵگەیەلەسەر پووچەڵبوونەوەی بژێویو رامانی حاڵوبارو سەفەرکردن.
*دەگونجێت سەهۆڵ بەڵگەبێت لەسەر پیاوی بەهێزو پشت ئەستوور.
*سەهۆڵ هیچ خێرێکی تێدا نییە بەهۆی بەستنی ، ئەوەی سەهۆڵو بەفر بەسەریا بباریٚ یاخود بکەوێتە نێوی بەڵاو نەهامەتییەك دادێت بەسەریاو تێدا وشكو داماو دەبێت، دەگونجێت تووشی لێدانو ئەشکەنجەدان بێت لەلایەن فەرمانڕواوە.
*بەستنیش غەموپەژارەو سزایە مەگەر مرۆڤ ئاوی تیا هەڵبگۆزیٚو بیکاتە نێو دەفرێكو شوێنەکەی بیبەستیٚ ئەوەش ماڵێکە مۆڵدەبێت لەشوێنی خۆیدا، بەستەریش گەنجینەی ماڵی فەرمانڕەوایە.
**سەینان**[1] **:** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نهێنی نێوان خۆیو کەسانیتر کەهیچکەس ئاگای لێنەبێت.

## س ی

**سی( کۆئەندامی هەناسە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: چاکی سی تەمەندرێژییە ، خراپی تەمەن کورتیەتی چونکە شوێنی روحو گیانە، ئەگەر بینی سی بۆگەنیکردوە بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونەوەی چارەنووسی چونکە سی شوێنی روحە.
(نابلسی) دەڵێت: سی شوێنی تورەبوونیەتیو بەژن لێکدەدرێتەوە.
*ئەگەر بینی سی رەشهەڵگیرساوە بەڵگەیە لەسەر:
+شکانی دەرگای سوودو قازانجی.

[1] **سەینان:** جۆرە دارێکە. (وەرگێڕ)

+تێکشکانی بەخشینی.

+شکانی پانکەو ئامێری فێنککەرەوە.

**سیخوڕ:** (نابلسی)دەڵێت: سیخوڕ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جنۆکە یان ئەوەی کاریگەری کاری شەڕو خراپە دەگەیەنێت بەسەرخێردا.

**سیر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: سیر پیاهەڵدانێکی ناقۆڵایە، هەروەها دەڵێن: ماڵو داراییەکی حەرامەو، خواردنیشی لەچێشتدا بەڵگەیە لەسەر تەوبەو پەشیمانی لەگوناهو تاوان.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئەبوهورەیرە)و دەڵێت: لەخەودا پێغەمبەری خوا(ﷺ)م بینی لەمزگەوت دانیشتوەو خەڵکی دێنە ژوورەوەو سڵاودەکەن، ئنجا منیش هاتم تا بێمە ژوورەوە بەڵام کۆمەڵە پیاوێك قامچیان بەدەستەوەبوو نەیانهێشت ، پاشان پێموتن: ڕێگەم بدەن با بێمە ژوورەوە، ئەوانیش وتیان: تۆ سیرت خواردوە، پاشان دەریانکردم.

(ئەبوهورەیرە) وتی: ماڵو داراییەکی پیستخواردوە.

(نابلسی)دەڵێت: خواردنی سیر بۆنەخۆش بەتەنیا بەڵگەی خێروچاکەیە. ئەگەر سیری هەڵکێشا زیان رووی تێدەکاتو هەڵکەندنی پیازیش هەروایە.

*هەروەها دەڵێن:سیروپیاز غەمو پەژارەیە.

**سینەما:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی چوە سینەما گوناهێك ئەنجامدەداتو بەدوای گوناهو تاواندا دەگەڕێ.

**سینی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: سینی خۆشەویستی پیاوە، ئەگەر سینیەکە پاقلەو ترشەمەنی لەسەربوو لەماڵی خۆشەویستو دڵدارەکەی دژایەتیو رقوقین بڵاودەبێتەوە.

(نابلسی)دەڵێت: سینی لەخەودا بەهەزار درهەم لێکدەدرێتەوە، یان بەسەد بەپێی توانای خەوبینەر.

**سیواك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سیواك لەسروشتو فیترەوەیە ، ئەمەش خەونی شوێنکەوتوانی ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەرەوە(ﷺ).

*ئەگەر بینی سیواکدەکات چاکە کاردەبێ لەگەڵ خزمەنزیکەکانیو پەیوەندی خزمایەتی بەجێدەهێنێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی سیواکدەکات سوننەتێکی پێغەمبەر (ﷺ) جێبەجێدەکات بەئەندازەی سیواکەکەیو پاککردنەوەی.

*ئەگەر بینی بە پوشێك سیواكدەكات سوننەتێك بەجێدەهێنیت بەماڵو سامانی حەرام.

*ئەگەر بینی سیواكی هەڵگرتوو كردوویەتی بەدەمیا بەڵگەیە لەسەر شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

*ئەگەر بینی سیواكدەكاتو خوێن لەنێو ددانەكانی دێت لەگوناهو تاوانەكانی بەدەردەكەوێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو گوناهو تاوانانەی ئەنجامیدەداتو زیان بەخانەوادەكەی دەگەیەنێتو ماڵو سامانیان دەبات.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی سیواكدەكاتو خوێنی لەبەر دەڕوات پیاوێكە غەیبەتی خەڵكیدەكات.

*سیواك بەڵگەیە لەسەر خۆپارێزی لەوتەو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پاكێتی لەگوناهو تاوانو موسوڵمانبوون دوای بێباوەڕیو قەرزدانەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+كارێك نزیكی بخاتەوە لەخوداوەند.

+بەجێهێنانی بەڵێنو پەیمان.

+دووگیانبوونی هاوسەر.

+هاوسەرگیری كەسانی رەبەن.

**سیوجگەر:**(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ماڵو سامانێكی كۆكراوەیە لەهەموو جۆرێك زێڕو زیوو گەوهەر.

## س ی

**سێبەر:**(نابلسی) دەڵێت: لەوەرزی هاویندا پشوو سوودو پلەوپایەو شكۆمەندییە دەچێتە ژێری، لەزستانیشدا بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو بیدعە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر دەستەڵاتدار چونكە سێبەری خوایە لەسەر زەوی هەروەك چۆن لەفەرمودەیا هاتوە.

*سێبەر زانایەكی خواناسی دنیانەویستە.

*ئەگەر بینی چو ژێر سێبەرەوە لەگەرمادا لەغەمو پەژارە قوتاردەبێو رزقو رۆزی بەدەستدەهێنێت.

*سێبەری ژن مێردەكەیەتی.

*ئەگەر ژنێكی بێمێرد روویكردە سێبەرێ پیاوێك دەیهێنێ شانو شەوكەوتو ماڵو سامانی هەیە.

*ئەگەر بینی تیشكی خۆری بینیو چوو روو بەرەو سێبەرێك لەغەمو پەژارە قوتاردەبێ.

*ئەگەر لەژێرسێبەردابوو سەرمایبوو روویكردە بەرتیشكی خۆر هەژاری دەرەوێتەوە چونكە سەرما هەژارییە.

**سێو:**(ئیبن سیرین)دەڵێت: سێو وزەو توانای پیاوە، ئەگەر پادشاو فەرمانڕەوابوو بینینی سێو موڵكو

دەستەڵاتەکەیەتی، ئەگەر بازرگانبوو بازرگانیەکەیەتی، ئەگەر چێنەربوو بەروبوومەکەیەتی.

*هەروەها سێو بۆئەوەی دەیبینێ هیمەتو ئیرادەیەتیو گرنگی پێدەدات، ئەگەر بینی سێوێکی لێکردەوە و خواردی یان بوو بەخاوەنی سێو بەئەندازەی ئەو سێوە هیمەتی بەدەستدەکەوێت.

*هەروەها دەڵێن: سێوی خۆش رزقێکی حەڵاڵە، مزرە سێویش رزقی حەرامە.

*ئەگەر دەستەڵاتدارێك سێوی تێکرت نوێنەرێکە ئومێدەکانی ئەوی لەخۆگرتووە.

*دارسێو پیاوێکی باوەڕدارە لەخەڵکەوە نزیکە، ئەگەر بینی داری سێو دەڕوێنێ منداڵی هەتیو بەخێودەکات.

*ئەگەر بینی سێوێك دەخوات ماڵێك دەخوات خەڵکی سەیریدەکات، ئەگەر لێبیکاتەوە ماڵو دارایی لەپیاوێکی رێزدارو بەناوبانگەوە دەستدەکەوێت.

*سێوی بژێراو درهەمو پارەی بژێراوە.

*ئەگەر بۆنی سێوێکیکرد لەمزگەوتێکدا ژندەهێنێت، هەروەها بۆ ژنیش شوودەکات، ئەگەر لەکۆڕێکدا بۆنیکرد ناوبانگ پەیدادەکات، ئەگەر خواردی لەشوێنێکی ناسراودا منداڵێکی باشیدەبێت، گازگرتنیش لەسێو بەدەستهێنانی خێروسوودو ئومێدو قازانجە.

*دەگێڕنەوە لە(هشام)ی کوڕی (عەبدولمەلیك)ەوە پێش خیلافە لەخەودا دەبینێ (نۆزدە) سێوو (نیو) بەدەستدەهێنێ، خەوەکەی بۆ راڤەکاری خەوێك دەگێڕێتەوە، ئەویش دەڵێت: (نۆزدە)ساڵو (نیو) تۆ فەرمانڕەوایی دەکەیت، زۆری بەسەرا رانەبورا فەرمانڕەوایی گرتەدەست.

(نابلسی)دەڵێت: سێو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر وەچەی نێرینەی رووخسار جوان، سێویش بەهاوڕێو برا دادەنرێت.

*ئەگەر بینی سێودەخوات دوژمنی بۆ دەردەکەوێت.

*سێویش بەڵگەیە لەسەر تامو چێژی جووتبوون.

*مزرە سێو بەڵگەیە لەسەر پەرتەوازەبوونو دەنگەدەنگو قاوقیژ، دارەکەشی بەڵگەیە لەسەر ترسوبیم.

# شین



**ش ا**

**شـاتوو:**(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا قەرزكردنی ماڵی خەڵكییەو وەك (درهەم)و (دینار) وایەو دارەكەی پیاوێكی ڕێزداری فرە پارەو منداڵدارە.

*ئەگەر بینی شاتوو دەخوات لەكاروپیشەیەكی فراوان بژێوی پەیدا دەكات.

*تووی ڕەش (دینارە)و هی سپی (درهەم)ە.

**شار:**(نابلسی)دەڵێت: شار بەڵگەیە لەسەر نیشتەجێبوانی ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر كۆبوونەوەو خەڵكی زۆرو شوێنی خۆ پەنادان چونكە كاتێ (موسی) (سەلامی خوای لێبێت) چوە شارەكە (شوعەیب) (سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی ﴿لا تخف نجوت﴾ (القصص:٢٥).

*دەگونجێت گوند بەڵگەبێت لەسەر دنیاو شاریش قیامەت، چونكە نازو نیعمەتی قیامەت بەرزو بڵندەو ماڵەكانی بێشومار گەورەن.

*دەگونجێت شار بەڵگەبێت لەسەر دنیا.

*دەگونجێت شارێكی ناسراو بەڵگەبێت لەسەر لانەی دنیاو شاری نادیاریش لەسەر قیامەتو پاشەڕۆژ ، گوندی ناخۆشو تەنگ بەڵگەیە لەسەر ئاگر بەهۆی نازو نیعمەتی خەڵكی شارو بەدبەختی گوندنشینان.

*ئەگەر لەگوندێكی نادیارەوە چوو بۆ شارێك تەماشای حاڵیدەكرێ ئەگەر بێباوەڕبوو موسوڵماندەبێ، ئەگەر گوناهباربوو تەوبەدەكاتو ئەگەر ساڵحو هەژارو نزمبوو دەوڵەمەند دەبێتو شكۆو ڕێزداری ڕووی تێدەكات، ئەگەر وێڕای چاكی ترسی هەبوو دڵنیادەبێت، ئەگەر خاوەن تیمێكبوو هاوسەردەگرێ، ئەگەر وێڕای چاكی نەخۆشبوو دەمرێ.

*ئەگەر لەلانەو ماڵێكی ناقۆڵاوە چوو بۆلانەو ماڵێكی خۆش لەئاگرەوە دەچێت بۆ بەهەشت.

*ئەگــــەر لەگونـــــدەوە چـــوو روو بەگونـدێکی نادیـار بـەواژووی حـاڵی یەکەمجارەوەیـە، ئەگـەر ناسـراوبوون نـاوو ناوەڕۆکیـان بەهەنـد دەگـیرێ، بۆئـەوەی دەگوێزرێتـەوە بڕیـاردەدات وەك کەسێك لەدارستانێکەوە رووبکاتـە شـارێكو لەخراپـە قوتـار ببـێو دەگـات بەویـستی خـۆیو لـەترس‌وبیم دڵنیـا دەبێــتو خوداوەنـــد دەفـــەرموێ: ﴿ادْخُلُـــوا مِـــصْرَ إِنْ شَـــاءَ اللهُ آمِنِينَ﴾(یوسف:٩٩).

*دەروازەو رێگەوبانی بـەناوبانگی شار دەستەڵاتدارەکانیەتی لەگـەڵ ئەوانـەی پارێزگاری لێدەکەن.

*لانــەو ماڵــەکانی جێنــشینەکانیەتی لەسەرۆكو گەورە پیاوان...

*هەندێکدەڵێن: شـار پیـاوێکی زانایـە ئەگــەر لــەدوورەوە بینــی ، هــەروەها وتراوە: شار قەرزارییەو هاتنـە دەرەوە لەشــار ترس‌وبیمــە بــەپێی ئایــەتی: ﴿فَخَــــرَجَ مِنْهَـــــا خَائِفَـــــاً يَتَرَقَّبُ﴾(القصص:٢١).

*چـوونە نێوشـار ئاشـتەواییە لـەنێوان خەوبینــەرو خەڵکیــداو بانگیدەکــەن بــۆلای حــەقو راســتی خوداوەنــد دەفــەرموێ: ﴿أُدْخُلُوا فِـي الـسِّلْمِ كَافَّـةً﴾(البقرة:٢٠٨) ئەمـەش لێـرەدا شارە.

*ئەگەر شارێکی دێرینی بینی وێرانبـوو لەوێدا منداڵ لەدایکبدەبێ یان لەوێدا خواناسیو دنیانەویستی روودەدات.

*ئەگەربینی چوە نێو شارێکی وێرانو هــیچ دیــواری تێدانــەبوو، ئەگــەر لـەورۆژگارەدا زانایـان هـەبوو دەمـرنو ساڵان تێدەپـەڕن بەسـەریانداو منـداڵو وەچەشیان لەدوا بەجێنامێنێت.

*ئەگــەر بینــی خــەریکی ئاوەدانییــە لەوەچـــەی زانایـــان کوڕێکیـــدەبێو هەڵدەکەوێت.

*ئەگەر شار یان ولاتێکی چۆڵو بەتاڵی بـــەتاڵی بینـــی نرخـــی خـــواردن بەرزدەبێتەوە.

*ئەگەر شار یان ولاتێکی فەڕپیتداری بینـیو کـشتوکاڵەکەی باشـبوو خێـرو چاکی دانیشتوانەکەیەتی.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر شارەکان هێمنو خامۆشبوون لـەکاتی بـوونی فەڕپیتـدا بەڵگەیـە لەسـەر قـاتو قـڕیو لـەکاتی نەبوونیـدا بەڵگەیـە لەسـەر فـەڕپیتو باشـتر وایـە مـرۆڤ شـارە ئاوەدانـەکان ببینێ ئـەوجا بەڵگەیـە لەسـەر بـەرزیو بڵندیو فەڕپیت.

*شار بەڵگەیە لەسەر باوباپیران، نموونەی ئەوەش پیاوێك بینی بەهۆی زەمین لەرزەوە کەوتو خاپووربوو، ئەوجا بڕیاردرا بەسەر باوکی بەکوشتن.

*دەگێڕنەوە (وکیع)لەگەڵ (قوتەیبە)بوو کاتێ لە(ری)ەوە چوو بۆ (خوراسان) (وکیع) لەخەودا بینی پەنجەرەکانی شار رووخان ، لەراڤەکارێکی پرسی ئەویش وتی: کەسانی رێزدار لەشانو شەوکەتو پلەوپایە دادەبەزن لەسەردەستی تۆ.

*ئەگەر شارێکی بینی رووخا یان هەندێکی رووخاو ناسرابوو ئاینی خەڵکەکەی دەفەوتیو دەگونجێت دنیایان بەسەربچێ بەهۆی خراپەیەك کەروودەکاتە ئاینەکەیان.

*شاری مرۆڤ کەدەچێتەوە سەری بەباوك لێکدەدرێتەوە ئەگەربینی شار بەهۆی زەمینلەرزەوە وێرانبوو باوکی دەکوژرێ.

*ئەگەر خۆی لەشارەبەرزەکانی عەرەبدابوو گرانی زیاد دەکاتو، ئەگەر لەشارەکانی خوارووی عەرەببوو فڕوفێڵو پلانی زۆردەبێ.

*ئەگەر خۆی لەولاتانی تر دییەوە ژینی ناخۆشدەبێو لەسەردەمو کاتی خۆیدا بەدبەختدەبێ.

*ئەگەر خۆی لە(میسر)و (فیوم) دییەوە خوداوەند بژێوی باشدەکاتو تەمەندرێژ دەبێت.

*ئەگەر خۆی لەگوندنشینەکان دییەوە ئەوا درۆدەکات بەدەم فەرزەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ).

*ئەگەر خێری لەناوچەی کەپرو دەوارنشین دییەوە خێرونازو نیعمەتی زیاددەکات.

*ئەگەر خۆی لە(قسطنطنیة)دییەوە ئەوا لەماڵوسامانی زەرەردەکات.

*ئەگەر خۆی لە(بیت لحم)و (برقاء)و (خولان) (سیناء) دییەوە نوێژو ئاینی زیاد دەکات.

*ئەگەر خۆی لەشارانی خۆرهەلاتدا بینی خێرێکی مەزنی دەستگیر دەبێ.

*ئەگەر شاری (بەغداد)ی بینی دێت بۆلای فەرمانڕەواو دەستەلاتدار.

*هەموو شارێك گەرماو سەرمای تێدابێ بەلاو نەهامەتی روودەکاتە خەڵکەکەی.

*ئەگەر خۆی لەچیای (خەلیل)و (ئەردەن)و (دەریاچەی طبریە)دییەوە سەفەرو ملکەچیو رسوایی دێت بەسەردا.

*ئەگەر خۆی لەشاری (دمشق)دی خوداوەند رزقو رۆزیو خێرێکی زۆری پێدەدات.

*ئەگەر خۆی لەولآتانی رۆخ و کەنارەکان دییەوە لای خەڵکی پەسەندەبێت.

*ئەگەر خۆی لەولآتی (روم)دییەوە متمانەی بەخودا هەیە.

*ئەگەر خۆی لەولآتانی ئەوروپا دییەوە دڵو دەروونی خۆش و بیرو هۆشی سافدەبن.

*ئەگەر لەولآتی (عەجەم)خۆی دییەوە فێری نزمیو سووکی خراپەدەبێ.

*ئەگەر خۆی لەولآتی (هند)دییەوە سەردەکەوێت بەسەرنەوەی دژایەتیدەکات و بەسەر ئیرەیی بەرانیدا زاڵدەبێت.

*ئەگەر خۆی لە(دیاربەکر)و ئەو ناوچانەی دیکەی دەوروبەریدا دییەوە حاڵوباری لەدنیادا باشدەبێ.

*ئەگەر خۆی لەچۆڵەوانیەکی ئاسمانیدا دی ماڵو ساسانی گرفت رووی تێدەکات.

*ئەگەر خۆی لەزەوییەکی شۆرەخاك یان کبریتیدا دییەوە نەخۆشدەکەوێت.

*ئەگەر خۆی لەولآتێکی ئاوەدانی پڕ لەخەڵکدا بینیەوە نازو نیعمەت لەلایەکەوە رووی تێدەکات خۆشی نازانێت.

*ئەگەر لەخەودا روویکردە شارێك بەڵگەیە لەسەر ئاشتی نێوان خۆیو خەڵکیو بانگکردنی بۆ حەق و راستی، ئەگەر لەوشارەدا روویکردە کۆشکێك ئەگەر دەستەلآتداربوو سەردەکەوێ.

*ئەگەربینی چوە نێو شارێکی دێرین و وێرانبوو پاشان گەلەکەی هاتن و بناغەی ماڵەکەیان هەڵکەند لەوشوێنەدا زانایەك لەدایکدەبێ یان پێشەوایەکی خواناس.

*ئەگەر شارێکی فەرپیتداری بینیو کشتوکاڵی باشی تێداکرابوو باشی حاڵی ئەو شارەیە، شار سوێندە خوداوەند دەفەرموێ: ﴿لا أُقسم بهذا البلد﴾(البلد:١).

*شار دڵنیاییە لەترس و بیم ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر کۆبوونەوەی یاران و بینینی باوەڕداران و گەیشتن بەهیواو ئومێد.

*بینینی (بدر)بەڵگەیە لەسەر زاڵبوون و سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللهُ بِبَدرٍ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ﴾(آل عمران:١٢٣).

*(حونەین)بەڵگەیە لەسەر دەرووی خێر دوای نارەحەتیو قەیران و تەنگەژە.

*مانەوە لە(شام)بەرەکەوت خێرە بۆ یەکێك لەنارەحەتیدابێت، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر فیتنەوە ئاشووب.

*شارەکانی (مەغریب، رۆژئاوا) زانیاریو بەرزیو بڵندی پلەوپایەیە.

*ئەو شارانەی خوداوەند وێرانیکردوە بەڵگەیە لەسەر ترس‌وبیمو کەموکورتی لەکێشانەدا.

*دەگونجێت شار بەڵگەبێت لەسەر تەوبەو لێخۆشبوون.

*هەرێم لەخەودا شکۆمەندیو بەرزیو دەوڵەمەندییە.

*دەگونجێت هەرێم بەڵگەبێت لەسەر دەستەلاتدارو فەرمانڕەواو زاناکەی.

*ئەگەر لەخەودا بوو بەخاوەنی شارێك یاخود فەرمانڕەوایی تێدا ئەنجامدا موڵكو دەستەلات یان پلەوپایەی بەئەندازەی پێویستو شیاو دەستگیردەبێت، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ، ئەگەر نەخۆشبوو چاکدەبێتەوەو، ئەگەر خراپەکاربوو تەوبە دەکاتو ئەگەر وێڵبوو رێنومایی دەکرێ.

*ئەگەر مردوو لەخەودا لەشارێك بینرا دەگونجێت لەبەهەشتدا هاوکاری جێنشینانی بکات، هەروەها ئەگەر لەشوێنێکی وێرانە بینرا بەڵگەیە لەسەر ئاگرو بەدبەختی جێنشینانیو بێئاگاییان.

*ئەگەر شارەکە ناوێکی باشی هەبوو وەك(صنعاء)بەڵگەیە لەسەر پیشەسازی یان شاری (باش) بەڵگەیە لەسەر باشی هەوڵو دەنگوباس یان سەرکەوتن بەسەر دوژمندا.

*شاری (ئەصفەهان)لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شەڕو خراپە لەلایەن جوولەکەوە، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ئاوارە.

*دەگونجێت (حیجان)لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر باوەڕو ئیمان.

*ئەگەر سنووری شار بەڕووخاوی بەدیکرا بەرپرسەکەی دەمرێ یان لەکاردەخرێ.

*ئەگەر بینی لەدەرەوەی شار خۆی مەلاسدا هەتا شێر یا لافاوی شار رەوییەوە ئیسلام لاواز دەبێت یان بازارسارد دەبێت بەتایبەت بازاڕی زانست.

**شاردنەوەی نهێنی:** (نابلسی) دەڵێت: دەگونجێت لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر شاردنەوەی زانیاری لەخەڵکی ئالوودەو شایستە. دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رەسەنی رەچەڵەك.

**شاری قـودس:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: ئەوەی ببینیٚ لـە(قـودس) نوێـژدەکاتو ڕووی لەقیبلـــەو ڕووگـــە نییـــە (حەج)دەکات.

*ئەگـەر بینـی وەك ئـەوەی دەسـتنوێژ دەگرێت لـە(قـودس) ماڵەکـەی شـتێکی تێکەڵدەبێت.

*دەرچوون لە(قودس) بەڵگەیە لەسـەر سەفەرو تیاچوونی میراتیەکـەی ئەگـەر لەژێر دەستی خۆیدابێت.

*ئەگـەر بینـی لـە(قـودس) چـرایەکی هـــەڵکرد کوڕەکـــەی دەپێکـــرێ یـــان نـــەزرێکی لەســــەرە کەبۆکوڕەکــــەی بڕیارداوەو دەبێت بەجێی بهێنێت.

(نابلـسی) دەڵێـت: ئـەوەی لەخـەودا ببینیٚ نوێژ دەکات لـە(قـودس) میراتـی بـۆ بەجێـدەمێنیٚو پابەنـد دەبێـت بەچاکەوە.

**شاعیر(بوێژ):** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: شاعیر پیاوێکـە ئـەوەی دەیڵـیٚ بـەجێی ناهێنێـتو شـیعر قـسەی سـاختەو بەتاڵـە، ئەگـەر بینـی شـیعرو هـۆنراوە دەڵـیٚو بـڕێوی پـیٚ پەیـدادەکات ئامادەی گەواهیدانی بەتاڵدەبیٚ[1].

*ئەگەر بینی هۆنراوەیەکی خوێنـدەوە لەنێو کۆمەڵێکدا داناییە.

*ئەگـەر گـوێی لەشـیعربوو ئامـادەی کۆڕێکدەبێت قسەی پڕوپـووچو بـەتاڵی تێدا دەکریٚ.

*ئەگـــەر بینـــی بـــوە بەعەجـــەمێکی ڕەوانبێـــژ ڕێـــزو مەزنییـــە یـــاخود فەرمانڕەوایـەك هاوچەشـنی نییـە یـان ئەگـەر بازرگـانبوو باسـدەکریٚ لـەنێوان خەڵکیدا.

*ئەگەر بینی بەهەموو زوبانێك دەدوێت کاروبارێکی گـەورەو لـەدنیادا دەگرێتـە دەسـت بـەپێی ئایـەتی: ﴿ اِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾ (یوسـف: ٥٥) واتـە:بەهـەموو زوبانێك.

(نابلـسی) دەڵێـت: دەگونجێـت بینینـی بوێـــژ بەڵگـــەبێت لەســـەر زینـــاو خواردنەوەی مەیو غەرامەکردن، ئەگەر خەوبینـەرە شـیعری لەبـەرکردو دانـایی یـان یەکتاپەرسـتی تێـدابوو یـاخود ستایشی پێغەمبەر(ﷺ) یان خەوبینـەر بـــوو بەشـــاعیر لەخـــەودا زانیـــاریو ڕێنومـــاییو پلەوپایـــەی بـــەرز بەدەســـتدەهێنێت ، بوێـــژ لەخـــەودا پیاوێکـــە ئـــەوەی دەیڵێـــت بـــەجێی ناهێنێت.

---

[1] پێیدەچیٚ ئەم لێکـدانەوەیەی (ئیبن سیرین) لەئایەتـی ﴿ والشُعَراء يَتبعُهُم الغاوون﴾ەوە سەریگرتبیٚ. (وەرگێڕ)

**شان(باهوو)**: (نابلسی)دەڵێت: هاوڕێو شەریك و كرێگرتەیە یان ئەوەی هەڵدەستێ بەوكارەو هەر رووداوو كارەساتێك رووی تێبكات دەدرێتە پاڵ ئەوانەی كەباسكران.

*شان بەڵگەیە لەسەر رزق و رۆزیو خێرو هەوڵدان بۆ نەخۆش. هەروەها بەڵگەیە لەسەر سەفەر خوداوەند دەفەرموێ: ﴿فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ﴾(الملك:١٥) مەبەستی سەفەرو گەڕانە بەنێو زەویدا.

(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئێش و ئازاری شان ئازاردان و شەكەتی دەستیەتی لەكارو فرماندا.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: شان هاوڕێ یان كرێگرتەیە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر رەق و زبربوو بەڵام گۆشتەكەی باشبوو بەڵگەیە لەسەر پیاوەتیو هێزی كردارەكان.

*لەبۆنآگرپەرستان بەڵگەیە لەسەر زۆرمانەوە لەزیندان هەتا دەتوانن كۆت و بەندەكانیان هەڵبگرن.

*ئەگەر بینی ناتەواویەك لەشانیدایە بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی براكان یان مردنیان چونكە هەردوو شان بران.

(نابلسی)دەڵێت: شان بەڵگەیە لەسەرئەوەی مرۆڤ هەڵیدەگرێ لەگوناه یان پێی هەڵدەگرن لەبارو شتیتر، ئەگەر باروكێشی بینی بەسەر شانیەوە قورسبوو بەڵگەیە لەسەر هەڵگرتنی گوناهی كەسانیتر.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێك بینی دەیەوێت یەكێك لەشانەكانی ببینێ بەڵام نەیتوانی ئنجا گۆتبووی ئەمەش بەوە لێكدرایەوە هەر زیادو كەمییەك رووی تێبكات هێزی مرۆڤ یان ژن لێكدەرێتەوە.

**شانازی**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+ماڵ و دارایی.

+فراوانی رزق و رۆزی.

+دەستفراوانی.

+زوبانباشی.

**شانە**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: هەندێك دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر خۆشحاڵی لەسات و ئانێكدا، چونكە پاكەرەوەو جوانكارێكە تاسەر بەردەوام نابێت.

*هەروەها دەڵێن: شانە دادپەروەرییە.

*هەروەها وتراوە: شانەكردن بەڵگەیە لەسەر زەكاتدان و شانە بەڵگەیە لەسەر زانیاریو ئەوەی سوود لەزانیاری وەردەگرێ.

*ئەگەر کەسێك سەرو ریشی شانەکرد ئەگەر غەمباربوو بەدووی غەمو پەژارەوە دێت، وەگەرنا کشتوکاڵەکەی چارەسەر دەکات یان چارەسەریدەکاتو خراپەی لێدوور دەخاتەوە لەوتە یان شەڕی لێدووردەخاتەوە.

(نابلسی)دەڵێت: پیاوێکی سوودکارەو غەموپەژارە دەڕەوێنێتەوەو بەڵگەی خێرە بۆیەکێك بیەوێت هاوبەشی بکەن لەگەڵبوونی کارو قەرزاری.

*ئەگەر شانەکردن بەهەسارەی زێڕو زیوبێت کرێکارن بەلاّم ئەستێرەی زێڕ کرێکاری راستگۆیەو ئەستێرەی زیو کرێکاری ناپاکە.

*قژداهێنان بەشانە زەکاتی ماڵوسامانە.

*شانە لەخەودا بریتییە لە:

+زەکاتی ماڵو دارایی.

+پیاوێکی دادپەورەرە.

+خۆشحاڵی چەند ساڵێك.

+ئەوەی سوود لەوتەی وەردەگرێ وەك دادوەرو پزیشكو ئامۆژگاریدەرە.

*شانە دایکی مرۆڤەو قژداهێنانی ژنێکی نادیار رەشەبایە کشتوکاڵ دەجووڵێنێت.

*هەروەها دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر بێژنگ یان هێڵەك.

*دەگونجێت ددانەکانی شانە تەمەنی خاوەنەکەی بێت، هەروەها وتراو کونە لەجلوبەرگدا یاخود مشاری دارتاشە.

*شانە بۆ شادیو خۆشییە ، ئەگەربینی سەرو ریشی بەشانە دادەهێنێ غەمو پەژارەی بەخێرایی لێدەڕەوێتەوە ، هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر زانیاری.

*شانە مرۆڤێکە خاوەن هاوڕێیانی هاوتاو دووڕوونو یەکتریان خۆشناوێت، ئەگەر شانەکە لەئاسنبوو پیاوێکی سوودمەندو باوەڕدارن.

*شانە بەڵگەیە لەسەر:

+تەمەنێکی دوور درێژ.

+ماڵوسامانی زۆر.

+سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا.

**شانەکراو( داهێنراو )**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەشانە بەڵگەیە لەسەری.

*شانەکراو بۆ پیاوی رەبەن هاوسەرێکی بەدینو ئارامە بۆ ژنیش پیاوو مێردە.

**شانەی هەنگ**: لەخەودا ژنی مێرددارەو مێشەنگەکەی وەچەیەو هەنگوینەکەی ماڵو سامانیەتی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قەڵاو حەشارگەو مێشەنگەکەشی خانەوادیەو هەنگوینەکەی ماڵو داراییە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+دەستبەرداربوونی غەمو پەژارە یاخود دەرەنجامی ئارامگرتن وەك هەنگوین شیرین بێت.

+دەستبەرداربوونی بەندایەتیو هەوڵو کۆشش.

**شاهەنگ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی بەسوودو قازانجی پیرۆزەو خواناسو دنیا نەویستەو ئازاری کەس نادات، ئەوەی شتێکی لێبەدەستبهێنێ ماڵێکی حەلاڵ لەگەڵ لەشساغی بەدەستدەهێنێ.

**شای شەترەنج:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پادشاو فەرمانڕەواو سەرکردە.

**شایەتی دادوەر (گەواهیدەری):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە زاڵدەبێت بەسەر دوژمنانداو بەرپەرچی دوڕوویی دەداتەوە.

* ئەگەر بینی شایەتی بەسەر مرۆڤێکدا تۆماردەکات قەرزدەدات، بەوەی شایەتی لەسەردەدات بەهەر پیتێك درهەم یان دینارێك.

* ئەگەر بینی شایەتی دەدات لەبەردەستی پیاوێکدا (حەج)دەکات.

* ئەگەر بوو بەشایەیەتی دادوەر دوژمنانی تووڕە دەکات.

**شایەتیدان:** (نابلسی) دەڵێت: شایەتیدان لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پەشیمانبوونەوە لەپەیمانو بەجێنەهێنانی نەزرو وازهێنان لەبانگەوازو قەرزدانەوە، ئەگەر شایەتی شاردەوە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر قەرزو چاوبرسێتیو چڵێسی لەئەمانەتو پشت سووری لەگوناهو تاوانو بوونی رقو قین ، یاخود دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی.

**شایی(ئاهەنگ):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بەمۆسیقاوەبوو کەسێك لەوشوێنە دەمرێ کەشایی تیادەگێڕێ.

* ئەگەر بینی خەریکی شاییو ئاهەنگگێڕانن بەلام بووکی نەدیو بۆشی باسو ناوزەدنەکرا کۆچی دواییدەکات، ئەگەر بووكو زاوای بۆ دەستنیشانکرا دنیا رووی تێدەکات.



**شفرە(تیغ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: شفرە زوبانەو بڕبەنگیش هەروایە.

(نابلسی) دەڵێت: دەگونجێت ژنێك بێت زۆر خزمەت بکات، یان بەڵگەبێت لەسەر رزق و رۆزیو بژێوی.
*قەڵەمدادەر کوڕێکی زیرەكو ژیرەو ئیرەیی بەباوکی دەبرێت.
*ئەگەر بەدەستیەوە بینی خوداوەند کوڕێکی باشی دەداتیّ.
*ئەگەر قەڵەمدادەری بەدەستیەوە بینی ژنێکی بۆ دەگەڕێتەوە لێی جیابوەتەوە.

**ش ك**

**شکۆ( بەرزی ):** (نابلسی)دەڵێت: شکۆمەندی مرۆڤ لەخەودا زیندوبێت یان مردوو بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەی بەرز لای خەڵکی، لەلای پەروەردگاریش بەهەمان شێوازە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رێنموونی بێباوەڕو تەوبەی سەرپێچیکار.

**شکۆمەندی( بەرزی ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ملکەچییە، ئەگەر بینی لەخەودا شکۆمەندە ملکەچو رسوابوە.

**ش م**

**شمشاڵژەن( نەیژەن ):** بینینی بەڵگەیە لەسەر سوتاو یاخود قسەوگوتەیەکی بێکەڵكو سوود.

*شمشاڵژەنی ئاهەنگو شایی بەڵگەیە لەسەر شادیو خۆشی.
*شمشاڵژەنی فەرمانڕەوا بەڵگەیە لەسەر جموجووڵو ئامادەکردنی سەربازان.
*شمشاڵژەن پیاوێکە بەمەرگ یان کوشتن یاخود زینا یا دەویتی ناوزەد دەکریّ، ژنیش بەوچەشنەیە گەر شمشاڵ بژەنێت.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پاشو دوای مرۆڤ.
*ئەگەر بینی شمشاڵژەن نادیارە شمشاڵ ژەنینی بەڵگەیە لەسەر نەخۆشکەوتنی پاشو دواوەی.
*ژەنینی شمشاڵ بەڵگەیە لەسەر گریانو لاواندنەوەی جەرگسووتاو.

**شمشێر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: شمشێر کوڕو دەستەڵاتدارە.
*ئەگەر بینی شمشێرێکی هەڵگرت دەستەڵاتێکی گەورە دەگرێتە دەست چونکە گەردن شوێنی ئەمانەتەو ئاسنیش کاریگەری بەهێزی هەیە.
*ئەگەر شمشێرەکە قورسبوو بەکێشیکرد لاوازدەبێت لەدەستەڵاتەکەیدا.
*ئەگەر بینی ئەوپەتەی شمشێرەکەی پێکێشدەکرد پچڕا لەدەستەڵاتەکەی دوور دەخرێتەوە.

*ئەگەر سەرەرمێکی دا بەژنەکەی یان ئەو شمشێرێکی پێدا لەکالانەکەیدا کورێکی لەو ژنە دەبێت، هەروەها وتراوە کچێکی دەبێ.

*ئەگەر چوار شمشێری لەخۆیدابوو: شمشێرێك لەئاسنو یەکێك لەقورقوشمو یەکێك لەزێرو یەکێکیش لەدار چوار کوری دەبێت، ئاسنەکە کورێکی ئازادەبێت ، زێرەکە کورێکی دەوڵەمەندو قورقوشمەکەش کورێکی نێرەمووكو،دارەکەش دووروودەبێ.

*ئەگەر بینی شمشێرەکەی دەرهێناو ژەنگیکردبوو کورێکی ناقۆڵای دەبێت، ئەگەر شمشێرەکەی لەکالانەکەیدا شکا کورەکەی لەسکی دایکیدا دەمرێ.

*ئەگەر کالانی شمشێرەکەی شکاو شمشێرەکەی دەرهێنا ژنەکەی دەمرێتو کورەکەی دەمێنێ، ئەگەر هەمووی شکا منداڵو دایکەکەی دەمرێت.

*ئەگەر بینی شمشێرێکی لەلاکانەکەی دەرهێناو ژنەکەی دووگیان نەبوو قسەو وتەیەکە ئامادەیکردوە، ئەگەر شمشێرەکە بەرەرو درەوشاوەبوو قسەکانی حەقو راستییەو تام چێژدارە، ئەگەر شمشێرەکە قورسبوو قسەیەکی قورسدەکرێ بەرانبەری و خۆی راناگرێ .

*ئەگەر درزێك لەشمشێرەکەیدا هەبوو ناتەواوییەکە لەزمانیداو ناتوانێ قسەبکات وەك پێویست.

*ئەگەر شمشێرێکی دەرهێنراوی لەبەربەرکانیدا هەڵکێشا حەقو راستی لای ئەوە.

*ئەگەر شمشێرێکی دۆزییەوەو گرتی بەدەستییەوە خاوەنی حەقەو دەیدۆزێتەوە.

*ئەگەر شمشێرێکیان پێدا ژنە بەپێی وتەی(لوقمان) دەربارەی (شمشێر) کاتێ دەڵێ: "نابینی چەن دیمەنەکەی جوانە بەڵام شوێنەوارەکەی ناشیرینو نابووتە".

*ئەگەر بینی دووشمشێر یان سیانی لەخۆیدابوو بچڕا ژنەکەی سێبەسێ تەڵاقدەدات.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی شمشێرەکەی دەرهێنا داوای گەواهیدانەدەکات لەخەڵکی بەڵام بەجێی ناگەیەنن بەپێی ئایەتی: ﴿سَلَقُوكُمْ بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ﴾(الأحزاب :١٩) واتە:شمشێر.

*ئەگەر بینی لەولاتی موسوڵمانان بەشمشێر بەلای راستو چەپدا شمشێر دەوەشێنێ زمانی بلاودەکاتەوەو قسەلەبابەتێکی ناشیاوو حەرامدا دەکات.

* ئەگەر شمشێر لەلاوە دەرکەوت پیاوێکی بەتواناو فریاگوزارە.
* ئەگەر باری هەڵگرت بەبێ شمشێر ئەسپەردەو ئەمانەت هەڵدەگرێ ، بارستایی شمشێریش باوكو مامە، یان دایكو پوورەو شکانی مەرگی یەکێکیانە.
* یاریکردن بەشمشێر دەدرێتە پاڵ دەستەڵاتو ژیریو وریاییەتی، ئەگەر درایە پاڵ قسەو وتار رەوانبێژییەتی، ئەگەر درایەپاڵ کوڕ سەرسامییەتی.
* ئەگەر شمشێر لەگەڵ رەشەبادا دەرکەوت نەخۆشی تاعونە، هەروەها دەڵێن: شمشێر بەڵگەیە لەسەر خەشمو قینی خەوبینەرو توندی باروحاڵی.
* پیاوێك هات بۆ لای (ئیبن سیرین) و وتی: پیاوێکم بینی لەناوەڕاستی مزگەتدا(مەبەستی مزگەوتی (بەسرە)بوو شێرێکی بەدەستەوەگرتبوو بەتوندی شمشێرەکەی کێشا بەبەردێکداو کردی بەدووکەرتەوە، (ئیبن سیرین) وتی: دەبێت ئەو پیاوە (حەسەنی بەسری) بێت، پیاوەکە وتی: خۆیەتی سوێندبێت بەخوا خۆیەتی، (ئیبن سیرین) وتی: دەمزانی (حەسەن) خۆی یەکلایکردوەتەوە بۆ ئاین لەشوێنی مزگەوتەکەو شمشێرەکەشی زمانیەتی کەبەردی پێدەکات بەدووکەرتەوەو حەق بەدەردەخات لەئایندا.
* (هیشام)بە (ئیبن سیرین)ی وت: شمشێرێکی هەڵکێشراوم بەدەستەوە بینیو لەکاتێکدا دەڕۆیشتم بەرێوەو لایەکم کردبوە سەرزەوی بەچەشنی گۆچان ، (ئیبن سیرین) پێی وت: ژنەکەت دووگیانە؟ وتی: بەڵێ، وتی: پشت بەخوا کوڕی دەبێت.
* پیاوێکی (هندیی) ئازا لەخەودا بینی شمشێرێکی قوتداو خەونەکەی بۆ راڤەکارێکی خەو گێڕایەوە، وتی: ماڵو سامانی دوژمنەکەت دەخۆیت ئەگەر بتبینیایە شمشێر تۆی قوت بدایە ئەوە مارێك دەیگەزتی.
* پیاوێك هات بۆلای (ئیبن سیرین)و وتی: لەخەودا بینیم رەشپێستێکم گرتو شمشێرم خستەسەری تا روحمدەرکرد، ئەویش وتی: ئەوەی سەرزەنشتو لۆمەی دەکەیت بەهەمان شێوە دەکات لەگەڵتا.
* شمشێر لەگەڵ چەکی دیکەدا دەستەڵاتە ، کوشتار بەشمشێر بەربەرەکانی گەلو نەتەوەیەکە ، لێدان بەشمشێر زمانو دەستپانکردنەوەیە ئەگەر زاڵبوونی تێدا بەدیبکرێ،

شمشێر بەتەنیا بەدەر لەچەکی دیکە کورە.

*ئەگەر شمشێرێکی بەدەستی خۆیەوە بینیو بەرزیکردەوە هەتا بارستایی سەرىو نەیویست بیوەستێنێ دەستەلاتێکی بەناوبانگ بەدەستدەهێنێتو ناوبانگی پێدەردەکات.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: نزیکترین لێکدانەوە بۆ شمشێر ئەگەر ئەوکەسە خوازیاری دەستەلاتبوو دەستەلاتە، وەگەرنا منداڵی نێرینەیە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی بەشمشێر لەمرۆڤێکیدا بەلێدانەکەی دەست یان کوڵمی یا قاچی بڕی یاخود ئەندامێکی دیکەی قسەو وتەیە لەنێوان خەوبینەرو لێدراودا روودەدات.

*ئەگەر بەشمشێر گەردنی مرۆڤی پێبڕىو سەرەکەی بەجیا بینی سەربڕاو لەسەربڕ خێروچاکەی دەستگیردەبێت یان دەروویەکی مەزنی لێدەکرێتەوە.

*ئەگەر بینی بەشمشێر لێدراو ئەندامەکانی بڕا لێدراو سەفەر دەکات، ئەگەر ئەندامەکانی لەیەك جیاکردەوە وەچەی لێدراو زۆردەبنو لەوڵاتدا بڵاودەبنەوە.

*ئەگەر بینی پیاوێك بەشمشێر بریندارێکرد بەبێ بەربەرەکانىو جەنگ پێکراوو پێکەر هاوبەش دەبن لەخزمایەتی گەلو نەتەوەو کۆمەڵێکدا یاخود هاوچەشنی ئەوە.

*شمشێر بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر فەرمانڕەوا یان زانیارى، ئەگەر غەریببوو بەڵگەیە لەسەر ژنو کوڕ، وەگەرنا ماڵێکی گوماناوییە لەبنەڕەتدا بۆگەنو پیسە، پاشان شمشێر بەڵگەیە لەسەر: ژنی شێت کەپەرێزی لێدەکرێ لەکاتی چوونە ژوورو هاتنەدەرەوەدا.

*شمشێری نەخشدار بەڵگەیە لەسەر توندوتیژىو ئارامگرتن لەسەر کارێکی ئەستەمو دەگمەن.

**شمشێری تیژو بڕەر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: تیژو بڕەر وەزیرێکی بەهەیبەتەو فەرمانو ڕێگریدەکات بەوەی سوودو زیاندەگەیەنێت.

*شمشێرەکانی سەربازەکانیەتىو پیاوەکانیشی فەرمانەکانیەتی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر زانا یاخود فەرمانڕەوا.

*شمشێرە بڕەرەکانی بەڵگەیە لەسەر فەتواو ئامۆژگارىو حوکمەکانی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر پزیشك.

*ئەگەر لەخەودا بوو بەشمشێری بڕەڕ کارێکدەکات شیاوبێت لەگەڵی.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی شمشێری بڕەڕ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+ڕەواندنەوەی غەمو پەژارە.

+زانیاری دوای ماندوبوون.

+هاوەڵایەتی پیاوچاکان ئەوانەی کەمو کوڕیەکانی نیشاندەرەوە.

## ش و

**شوان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: شوان خاوەن دەستەڵاتەو بەڵگەیە لەسەر:

+مامۆستای منداڵان.

+ئەوەی کاروباری فەرمانڕەوا دەگرێتەدەست.

*ئەگەر عەرەبێك بینی شوانی مەڕو ماڵاتە قورئاندەخوێنێت بەڵام لەواتاو ماناکانی تێناگات.

(نابلسی) دەڵێت: شوان بۆ بەردەستەکانی هەوڵو کۆششدەداتو هەوڵدەدات بەسۆزو میهربێت لەگەڵیان.

*ئەگەر بینی بوە بەشوان دەستەڵاتێکە پێیدەگات بەشێوەی بینینی بۆ مەڕەکانو لەخەدا پیاوی ڕێزدارە.

*بینینی شوان بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەی بەرزو شکۆمەندیو هەڵسوکەوتکردن بەسەر ژێردەستەکانەوە بەدادپەروەرانە، مەگەر شوانی بەرازبێت ئەوجا بەڵگەیە لەسەر تێکەڵبوون لەگەڵ مەسیحیو بیدعەکاران.

**شوعەیب(سەلامی خوای لێبێت):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر حەزرەتی شوعەیبی بینی شڵەژابوو بینایی چاوەکانی لەدەستدەدات، ئەگەر لەحاڵو بارێکیتردا بەدیکرد کۆمەڵێك مافی دەخۆنو ستەمی لێدەکەن، پاشان دەیانبەزێنێ.

*دەگونجێت ئەو خەونە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی خاوەنەکەی کچدارە.

**شوێنەوار:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دوژمنو پلەوپایەو بەدەستهێنانی پێداویستیو زانیاریو زانست.

**شوێنەوارزانی ئاژەڵ:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ڕاگوێزانو سەرتاشین، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر شەڕو ئاژاوەو ماڵو سامان خەرجکردن.

**شوێنەوارهەڵگر:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەرخستنی نهێنیوکاری شاراوە یان زانیاریو شوێنەوار هەڵگری زانایان.

**شوێنی ئیسماعیل( سەلامی خوای لێبێت ):**(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا خۆی لەوێدا بینیەوە کوڕێکی دەبێت و یارمەتی و هاوکاریدەکات، دەگونجێت ئەگەر ماڵ و دارایی داربێت ڕێگە نەدرێت هەڵس وکەوت بەماڵەکەیەوە بکرێت.

**شوێنی حوشتر:**(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا شوێنی کۆبوونەوەیە وەك مزگەوت و خان و ئوتێل بازرگان و خەڵکی ڕووی تێدەکەن هەر تەنگی و فراوانییەکی تێدا ببینرێ دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەباسکرا.

**شوێنی حەزرەتی ( ئیبراهیم ) ( سەلامی خوای لێبێت ):**(نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی چوەتەلای و ڕووبەو شوێنە نوێژ دەکات پیاوێکی باوەڕدارەو پارێزگاری لەشەرعدەکات و (حەج)یش ئەنجامدەدات بەپێی ئایەتی: ﴿ فيه آيات بينات مقام ابراهيم ﴾ (ال عمران: ٩٧).

*ئەگەر ترسابوو ئەوجا چوە شوێنی (ئیبراهیم) دڵنیا دەبێت.

*دەگونجێت چوونە نێو شوێنی (ئیبراهیم) بەڵگەبێت لەسەر بەدەستهێنانی پلەوپایەی بەرز یاخود هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی زانیاری یاخود میراتی لەباوکیەوە بۆ دەمێنێتەوە.

*دەگونجێت دانیشتن لەوشوێنەدا بەڵگەبێت لەسەر رامان لەسەر سنوورێك هەتا دەگوێزرێتەوە.

**شوێنی خۆڵ و پیسی:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: شوێنی خۆڵ و پیسی دنیایە، هەر بەوەش پێغەمبەر (ﷺ) چواندویەتی کاتێ لەسەری وەستاوە. خۆڵ ئاوە چونکە لەخاك و خۆڵی زەوییەو پاشەڕۆیەکە خەڵکی فڕێیدەدەن.

*ئەگەر خۆی لەشوێنێکی خۆڵ و زبڵی چەپەك دییەوە تەماشای حاڵ وبارییکە لەگەڵ ئەو کردارانەی کەلەگەڵی شیاوو گونجاون ، ئەگەر نەخۆشبوو یاخود ترسابوو لەتیاچوون بەهۆیەك لەهۆیەکانەوە مژدەی قوتاربوون یان تێکەڵبوون لەگەڵ دنیای پێدەدرێ کەبەزبڵدان چوێنراوە.

*ئەگەر هەژارێك شتێکی ئاوای بینی دەوڵەمەند دەبێ لەدوای هەژاریی و ماڵ وسامان پەیدادەکات، ئەگەر کەسێکی هەبوو خوازیاری میراتییەکەی بوو میراتیەکەی پێدەگات چونکە زبڵ

لەکۆکراوەی کەسانیترەو لەپەیداکردنی خۆی نییە.

*زبڵدان وەك ماڵێکی کۆکراو وایە لێرەو لەویٚ بەپێی خۆپاراستنو گویٚ پێدان بەهۆی ئەو تێکەڵییەی تێدایە ، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگریٚ ، ئەگەر وانەبوو زبڵدانەکە فرۆشگاو دوکانەکەیەتی.

*ئەگەر شایستەی دادگاو دەستەلاٚتو پارەوەرگرتن لەخەڵکبوو پێیدەدریٚ ، ئەوجا ماڵو سامانی پێدەدەن لەگەڵ سوودو قازانج لەمیراتیوشتیتر.

*دەگونجێت زبڵدان بۆ پادشاو فەرمانڕەوا گەنجینەو خەزنەداربێتو بۆ دادوەریش لانەیەکی دڵنیاو بەئارامو ئەمانەتپارێزی بێت.

*ئەگەر لەزبڵدان خوێندنەوەیکرد ئەگەر دادوەربوو لادەبریٚ ، ئەگەر نەخۆشبوو دەمریٚ ئەگەر هەژاربوو خۆیدەپارێزیٚ.

**شوێنی دژوارو ناهەموار:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر خۆی لەشوێنێکی دژوارو ناهەمواردا بەدیکرد پاشان خۆی لەشوێنێکی ئاساندا دییەوە بەڵگەیە لەسەر ئاسانی کاروبارەکانیو قوتاربوونی لەناڕەحەتیو بەلاٚو نەهامەتی.

*ئەگەر خۆی لەشوێنێکی خۆشو ئاساندا بینی پاشان شوێنێکی دژوارو ناهەموار بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو ماندوبوونو رامانی حاڵوبار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر وەستانی جموجووڵو تەمەندرێژی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر وێڵیو سەرگەردانی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر گێژیو ئاسانیش بەڵگەیە لەسەر ژیری.

**شوێنی نوێژی جەژن:** (نابلسی) دەڵێت: شوێنی نوێژی جەژن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+شادیو خۆشی.

+رەواندنەوەی غەمو پەژارە.

+لەشساغیو چاکبوونەوە.

+قوتاربوون لەزیندان.

+هەینیو ئەنجامدانی نوێژی هەینی.

+جوانیو پاکێتی.

*دەگونجێت نوێکردنەوەی بەڵگەبێت لەسەر تەوبەی خراپەکارو موسوڵمانبوونی بێباوەڕو هاتنەخوارەوەی بارانو سەرکەوتن.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر:

+بێکاری.

+بازاڕساردی.

+وەستانی جموجووڵ.

+سەفەرو حوشترو مەڕو ماڵاتی دەردەدار.

*شۆرێنی نوێژی مردوو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو وێرانبوونی ئاوەدانیو تەلاقی هاوسەر، هەروەها بەڵگەیە لەسەر سەفەری دوور.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دانانو لابردنی خاوەن پلەوپایە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+رزگاربوون لەزیندانو پاکبوونەوە.

+پشوودان بەهۆی ماندبوونەوە.

+قەرزدانەوە چونکە مردوو رزقو رۆزی تەواوبووە.

*ئەگەر قەرزاربوو داوای قەرزەکەی لێدەکرێتەوە.

## ش وو

**شوورەیی**:(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا چوستو چالاکیە یاخود لاوازیو دۆڕاندنو شکستخواردنە لەکاتی روو بەروبوونەوەی دوژمندا. بۆ خەڵکی ماندووش بەڵگەیە لەسەر پشوودان.

**شووشە**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: شووشە هیچ بوونێکی نییەو ناخو بناغەی ژنانە، بینینی لەدەفرێکدا زیانی کەمترە.

*هەروەها دەڵێن: غەمو پەژارەیەکی کەمە.

*هەروەها لە(ئوم سەلەمە)ەی دایکی موسوڵمانانەوە (رەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە: لەخەودا بەئاگاهاتووە بەگریانەوە ، لێیان پرسیوە بۆ دەگری؟ وتویەتی: پێغەمبەری خوام بینیو شووشەیەکی بەدەستەوەبوو، لێمپرسی چییە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: "خوێنی حسێنی تێدا کۆدەکەمەوە" زۆرینەبرد مەرگی حەزرەتی(حسێن)و کارەساتە دڵتەزێنەکەی روویدا.

(نابلسی)دەڵێت: ئەوەی شووشەیەك ببینێو شتێکی لێپەنهانبوو دوایی بۆیدەردەکەوێت چونکە شووشە هیچی تێدا ناشاردرێتەوە، بەلام ئەوەی لەشووشەی سەوزو سوور و زەرد یان سەدەفی گەوهەر دروستدەکرێ هاوچەشنی گومانە لەماڵو دارایی ژنو منداڵەو رووپامایيو گوێهەڵخستنو دووڕوویيو ئەوەی چارەسەری پێدەکرێو بەڵگەیە لەسەر زاناو دانا.

*ئەگەر لەخەودا شتێك بکڕێ یاخود وەربگرێ وەك گەوهەر بەشووشە یان ماڵو لانە بەسەدەف بەڵگەیە لەسەر هەڵبژاردنی دنیا بەسەر قیامەتدا یان سەرپێچیە بەسەر گوێڕایەڵیدا یاخود لەئاینەکەی پاشگەزدەبێتەوە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: شووشەو ئەوەی لێی دوستدەکرێ هەڵگرتنی لەخۆبایبوونەو شکاویشی ماڵو داراییەو

جوان‌و رازاوه‌شی قاپ‌و قاچاغ‌و هاوسه‌رو خزمه‌تکارو ژنه، زۆریشی له‌ماڵدا به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر کۆبوونه‌وه‌ی ژنان له‌خێر یان شه‌ڕدا.

(ئیبن سیرین) ده‌ڵێت: خزمه‌تکاریکی دوودڵه له‌گواستنه‌وه‌ی ماڵ‌و دارابیدا.

هه‌روه‌ها ده‌ڵێت: ئه‌گه‌ر شووشه‌ی نادیاری بینی ته‌مه‌نی کورتده‌بێ.

**شووشه‌ساز( شووشه‌چی ):** (ئیبن سیرین) ده‌ڵێت: شووشه‌ساز بازرگانی به‌ئافره‌ته‌وه ده‌کات.

(نابلسی)ده‌ڵێت: به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر له‌خۆباییبوون به‌خودی خۆی‌و ماڵ‌و دارایی.

(نابلسی) ده‌ڵێت: بینینی له‌خه‌ودا به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر پاکی ژیان‌و چاودێری نه‌زان‌و ده‌رخستنی نهێنی.

*ده‌گونجێت به‌ڵێت له‌سه‌ر ئه‌و سه‌رانه‌یه‌ی که‌سی پێشێلکار ده‌یدات.

**شووشه‌ی مه‌ره‌که‌ب:** (ئیبن سیرین) ده‌ڵێت: خزمه‌تکار سوودێکه له‌لایه‌ن ژنه‌وه به‌پیاو ده‌گات‌و پله‌وپایه‌یه‌کیشه له‌لایه‌ن کوڕه‌وه به‌پیاو ده‌گات.

*ئه‌گه‌ر مه‌ره‌که‌بی له‌شووشه‌یه‌کدا بینی خزمه‌تکارێك ده‌گرێ‌و کاری نابه‌جێی له‌گه‌ڵدا ده‌کات‌و دواتر هیچ پله‌وپایه‌و ئاستێکی له‌لا نامێنێت.

*هه‌روه‌ها ده‌ڵێن: ئه‌گه‌ر بینی شووشه مه‌ره‌که‌بێك به‌ده‌ستده‌هێنێت له‌گه‌ڵ هاوسه‌ره‌که‌یدا ده‌نگ داده‌بڕێت.

*زۆرێك له‌راڤه‌کارانی خه‌و ده‌ڵێن: شووشه‌ی مه‌ره‌که‌ب هاوسه‌رو ماره بڕینه ، هه‌روه‌ها مه‌حبه‌ریش به‌و چه‌شنه‌یه به‌ڵام کچ‌و کوڕ ده‌بێت.

*قه‌ڵه‌م نێره ، ئه‌گه‌ر ژنبوو قه‌ڵه‌مووچه‌که‌ی ماڵ‌و دارایی‌و سوودو قازانجه یاخود غه‌م‌و په‌ژاره‌یه به‌تایبه‌ت ره‌نگی ره‌ش رووی یان جل‌وبه‌رگه‌که‌یه‌تی.

*هه‌روه‌ها شووشه‌ی مه‌ره‌که‌ب به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر برین‌و تلۆق بۆ یه‌کێك به‌له‌ش‌و لاری خۆیه‌وه ببینێ‌و قه‌ڵه‌م به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئاین، په‌ڕه‌مووچه‌که‌ی به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ماوه بۆ یه‌کێك بۆئه‌وه‌ی شووشه‌ی مه‌ره‌که‌ب به‌له‌ش‌و لاری خۆیه‌وه ببینێ‌و قه‌ڵه‌می تێبکات.

*ئه‌گه‌ر بینی له‌لاپه‌ڕه‌یه‌کدا ده‌نووسێته‌وه میراتیه‌کی بۆ ده‌مێنێته‌وه به‌پێی ئایه‌تی: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ ، صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴾ (الأعلى : ١٨ ـ ١٩).

*ئه‌گه‌ر له‌خه‌ودا بینی وه‌ك ئه‌وه‌ی له‌کاغه‌زێکدا ده‌نووسێت نکوولیکردنه له‌وه‌ی له‌نێوان خۆی‌و خه‌ڵکیدا رووده‌دات.

*ئەگەر بینی پێشەوایەك كاغەزێكی دایە پێداویستیەكی بۆ جێەجێدەكاتو بەرزیدەكاتەوە بۆی.

*كاغەز بەڵگەیە لەسەر رووداووكارەساتێكی نادیارو تێكەڵ بەپێی ئایەتی: ﴿ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا ﴾ (الأنعام : ٩١).

(نابلسی) دەڵێت: شووشەی مەرەكەب لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شكۆمەندیو دەوڵەتو بەرزی بەپێو ئەندازەی خۆی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر هاوسەرو ماڵو دارایی.

*ئەگەر بینی مەرەكەبدانێكی كڕیوە ژنێكدەكات بەهاوسەریو رۆژێكی خۆشی لەگەڵ بەسەر نابات، چونكە قەڵەمەكەی نایەتە دەرەوە بەمیدادو درێژكردن نەبێت.

*شووشەی مەرەكەب بەڵگەیە لەسەر دەرمانو چارەسەر ، ئەوەی ببینێو نەخۆشیش بێت ئەوە روو لەچارەسەر دەكاتو پشت بەخوا چاكدەبێتەوە.

## ش ۆ

**شۆڕكردنەوە ( نزیكبوونەوە ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی خۆی شۆڕكردوەتەوەو نزیكبووەتەوە لەبەرزاییەكەوە بۆ خوارەوە لەهەموو حاڵو بارێكدا خۆی دەپارێزێتو دەستبەرداری داواكارییەكانی دەبێت بەهۆی خۆپارێزییەوە.

*ئەگەر بینی لەبەرزاییەكەوە دەكەوێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی ناهومێد دەبێت لەپیاوێك كەئومێدی پێخواستوە یان لەپلەوپایەی خۆی دادەگیرێت بەهۆی قسەولێدوانێك كەدەیكات.

*ئەگەر بینی لەكەوتنەخوارەوەیدا كەوتە نێو قوڕەوە وازلەكاروبارێكی ئاینی دەهێنێت یان كاروبارێكی دنیایی.

(نابلسی)دەڵێت: خزمایەتیو نزیكی لەخەودا ناشیاوو گونجاوە وەك نزیكبوونەوە لەدڕندەو جانەوەر ئەمەش بەڵگەیە لەسەر هەواداری شەڕەنگێزو خراپەكاران بەهۆی ئەوەی دەچێتەوە سەری لەخزمایەتیو هاوڕێیەتی، ئەگەر نزیكبوەوە لەمەڕو مانگا یان حوشتر رووداكاتە خێرومەندو چاكەكار.

**شۆڕەبی :** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێكی پلەبەرزی بەئارامە.

*ئەگەر بینی لەماڵەكەیدا دارێك رواو سەوزبوو لەهەموو روەكەكانیتر جوانتربوو بەڵگەیە لەسەر بوونی منداڵێكی رێزدارو پیرۆز لەوماڵەدا.

## ش ە

**شەپۆلی ئاو**:(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا توندیو سزایە بەپێی ئایەتی: ﴿واذا غشيهم موج كالظلل دعوا الله مخلصين له الدين﴾(لقمان:٣٢). هەروەها ئایەتی:﴿ وحال بينهما الموج فكان من المغرقين﴾ (هود:٤٣).

**شەترەنج**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: یاری شەترەنج هەوڵدانە لەکوشتار یان دژایەتیدا.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکی تێکەڵو پێکەڵو بۆ فەرمانڕەواو سەرۆك شارێکی گەورەیە لەگەڵ شادییو ئاهەنگگێڕان.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی یاری شەترەنجدەکات بەریەرەکانی کۆمەڵێکدەکات باوریابێت لێیان.

*شەترەنج لەخەودا گوتەی پووچو بەتاڵەو بەڵگەیە لەسەر جەنگێکی لاواز، ئەگەر بینی یاری پێدەکاتو سەردەکەوێت لەبێداریو بەئاگاییدا بەسەر نەیارو بەرانبەرەکەیدا.

*شەترەنج جەنگو دژایەتییەو ئاگاداربوونی نهێنییەو شوێنکەوتنی شوێنەوارو گواستنەوەیە لەحاڵێکەوە بۆ حاڵێکیترو تێکچوونی ویستو سەفەرە.

**شەربەت ( خۆشاو )**:(نابلسی) دەڵێت: هەموو شەربەتێکی ڕەنگزەرد لەخەودا نەخۆشییە، ئەگەر بینی مەیو بادە دەخوات لەنەخۆشییەکەی یان هەر شتێك زیانی پێبگەیەنێت چاکدەبێتەوە، ئەگەر کاتێ خواردیەوە خەشمی لێدەبووەوە نەخۆشیەکی سووکدەگرێو پاشان چاکدەبێتەوە.

*ئەگەر مرۆڤێك بینی شەربەتی هەنگوین دەخواتەوە یان شەربەتی سێوو هەموو شەربەتێکی بەتامو چێژ بۆ دەوڵەمەند خێرو دەروازەیەو بۆ هەژار خراپە چونکە ئەوان چاونابڕنە ئەو شەربەتانە، مەگەر نەخۆشو ناچاربن بیخۆنەوە.

*شەربەتی سێو سوودو قازانجە لەلایەن خزمەتکارەوە یان دنیایەکی خەماویە.

*ئەگەر لەخەودا بەهۆیەکەوە شەربەتێکی خواردەوە بەڵگەیە لەسەر ڕەواندنەوەی ئەو نەخۆشییە، وەگەرنا خواردنەوەی بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی نەخۆشی.

*شەربەتی ئاسایی‌و سروشتی بەڵگەیە لەسەر ڕێز یان دەرخستنی نهێنی‌و ڕاستی‌و ئاگاداری.
*ئەو شەربەتانەی گیرانی جگەر چارەسەر دەکەن بەڵگەیە لەسەر ئەندازەو ڕەوشە شەرعیەکان‌و ڕێکخستنی کاروبار چاککردنی حاڵ‌وبار.
*دەگونجێت شەربەتی میوەکان بەڵگەبێت لەسەر میوەکان.
*دەگونجێت شەربەتی گوڵاو بەڵگەبێت لەسەر بەڵاو نەهامەتی ژنان.
*ئەگەر لەخەودا شەربەتێکی نادیاری خواردەوە بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی دڵنیایی‌و بەجێهێنانی نەزرو بەتایبەت ئەگەر شەربەتەکە گوڵاوبوو، بەڵام ئەگەر شەربەتی بۆن ناخۆشبوو لەدەفرێکی حەرامدا بەڵگەیە لەسەر ناسوپاسگوزاری نیعمەت‌و پاشگەزبوونەوە لەئاین ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مردوەکەی لەبەهەشتدایە.
*دەگونجێت شەربەتی نادیار بەڵگەبێت لەسەر شەربەتی حەقپەروەران‌و چاودێرکراوان.
*دەگونجێت شەربەت لەپەرداخدا بەڵگەبێت لەسەر خەڵات‌و پاداشت.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: شەربەت‌و گوشینی زۆرباشە ، ئەوەی ئەوکارە ئەنجامدەدات ئەوە سەیری حاڵیدەکرێ ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت.
*ئەگەر خەوەکەی گشتیبوو واتە کۆمەڵێکی بینی ترێ دەگوشن لەهەموو شوێنێك یان زەیت‌و سەرجەم گوشراوەکان دەگوشن‌و لەناڕەحەتیدابوون ئەوە فەڕو بەرەکەت دەکەوێتە نێویان‌و دەروویان لێدەکرێتەوە ، ئەگەر نەخۆشێك کارێکی ئاوای بینی یان زیندانیەك قوتاردەبن لەوەی تێیدان، ئەگەر یەکێکی خاوەن دانەوێڵەو قەرز خەوێکی لەو چەشنەی بینی قەرزەکەی دەداتەوەو سوودو قازانجدەکات .
ئەگەر خوێندکارێکی زانست خەوێکی لەو چەشنەی بینی شارەزا دەبێت تێیداو ڕاوبۆچوون بەلێشاو لەسینەی دێتە دەرەوە.
*ئەگەر کەسێکی ڕەبەن خەوێکی ئاوای بینی هاوسەر دەگرێ‌و بژێوی باشدەبێ.
*ئەگەر شەربەتەکە زۆربوو هەنجیر یان مەی‌و شیری بەدەستهێنا دەستەڵات بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی ترێی گوشیی و کردی بەمەی و بادە لای دەستەلآتدار پلەوپایە بەدەستدەهێنێ و ماڵێکی حەرام دێتە دەستی بەپێی چیرۆکی حەزرەتی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت).
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا ترێ دەگوشێ فەرووپیت بەدەستدەهێنێ.

**شەربەتساز:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر باوەڕو یەکتاپەرستی و تەوبەی سەرپێچیکارو زانیاری بۆ قوتابی.

**شەربەتفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رووتێکردن و شادی یان لابردن و گرتنەدەست و ماڵ و دارایی و پلەوپایەی بەرزو بالآ.

**شەربەتی خورماو مێوژ:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر خەم و پەژارە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ناخۆشی ژیان و نەبوونی.
*ئەوەی شەربەتی مێوژی خواردەوەو بۆ دەستەلآت باشبوو بەدەستی دەهێنێت، ئەگەر باشنەبوو واپێویستدەکات بدرێتە پاڵی.
*شەربەت ماڵێکی حەلآلە ماندوبوون و هیلاکی تێدایە.

*ئەگەر بینی شەربەت یان بادەی خواردەوە ماڵ و سامانە بەماندوبوون بەدەستدەهێنێ.
*خواردنەوەی شەربەت لابردنی فەرمانڕەوایە وەك خواردنەوەی مەی و بادە وایە.
*نەمانی شەربەتی خورما ماڵێکە گومان یان غەم و پەژارەی تێدایە.

**شەرم:** (نابلسی) دەڵێت: شەرم و حەیا لەخەودا بەخششە لەلایەن خوداوە یاخود خۆگرتنەوەیە لەئەنجامدانی خراپەو، بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی باوەڕو رزق و رۆزی و دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رێنومایی سەرپێچیکارو باوەڕهێنانی بێباوەڕ.

**شەرواڵ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: شەرواڵ ژنێکی عەجەمی یا ژنێکی پابەندە، ئەگەر بینی شەرواڵی کڕی لەیەکێکیتر ژنێکدەکات بەهاوسەری خۆی بەبێبەرپرس.
*شەرواڵی نوێ کچە ، شەرواڵ بەڵگەی پارێزگارییە لەتاوان و گوناە.
*هەروەها وتراوە بەڵگەیە لەسەر چاکی و راستی ژن و خانەوادەکەی.
*لەپێکردنی شەرواڵ بەبێکراس هەژارییەو پۆشینی بەهەڵگەڕاوی

ئەنجامدانی گوناهو تاوانە لەنێو خانەوادەیو میزکردنی تێدا بەڵگەی دووگیانبوونی ژنەکەیو پیساییکردنی تێدا بەڵگەیە لەسەر دووگیانی ژنەکەیو هەڵوەشانی شەرواڵەکەیو دەرکەوتنی ژنەکەیەی بۆ پیاوانودەستبەرداربوون.

*هەروەها دەڵێن: شەرواڵ بەڵگەیە لەسەر سەفەری کۆمەڵێك بۆ لای گەلو نەتەوەیەکی عەجەمی.

*هەروەها دەڵێن: شەرواڵ چاکی حاڵوباری خانەوادەیو نوێبوونەوەی خۆشیو شادییە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی شەرواڵی پێدرا نارەحەتیو مەینەتی لێدووردەکەوێتەوە.

**شەریکایەتی( هاوکاریی ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: شەریکایەتی بەڵگەیە لەسەر دادپەروەیی، ئەگەر بینی شەریکایەتی لەگەڵ پیاوێکدا دەکات هەریەکەیان چاودێریو دڵی بەرانبەری رادەگرێ بەوەی لەنێوانیاندایە.

*ئەگەر بینی بوو بەشەریکی پیاوێکی بەتەمەنی نەناسراو باپیرەیەتیو بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی دادپەوەری لەو ساڵەدا.

*ئەگەر بینی بوە بەهاوکاری لاوێکی نادیار لەدوژمنەکەیدا دادپەروەری لەگەڵ ترسان لەبەلاو ستەمو خەشمگەریی بەدیدەکات.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا خۆشحاڵییە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیادەرەوی لەخواناسیدا یان ئەوەی سوودو قازانجی دنیای تێدایە.

*بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی هەژار ئەگەر بەشداریکرد لەگەڵ یەکێکدا کەلەخۆی بەرزتربوو، بەلام ئەگەر خوازیاری میراتیبوو بەدەستیدەهێنێتو هاوبەشیدەکات. شەریکایەتی بەڵگەیە لەسەر دڵسۆزیو نەخۆشەویستیو راستگۆیی لەپەیماندا.

**شەڕەشۆق:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خۆئامادەکردن بۆ جەنگو کوشتار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئامادەبوون لەکاری بیدعەو وێڵیو سەرگەردانیدا.

*شەڕەشۆق بەکەللە ئەگەر کەسێك سەری کێشا بەسەری هاوڕێکەیدا بەڵگەیە لەسەر بەلاو نەهامەتی کەڕوو لەهەریەکێکیان دەکات یاخود شەڕو ئاژاوە رووتێکردن ، ئەگەر خوێن لەکەللەیان هات دەرەنجامی کاروبارەکانیان روو لەشەڕو زیانە.

دەگونجێت ئەنجامدانی بەڵگەبێت لەسەر شانازی بەڕەچەڵەکەوە.

**شەڕەکەڵەشێر:** (نابلسی)دەڵێت: هاندان‌و وروژاندنی نێوانی زاناو بانگبێژانە.

**شەفاعەت( تکا ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ناپاکی‌و ساختەکردن، هەندێکیتر دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندی‌و مەزنی چونکە کەسێك شکۆمەندنەبێ شەفاعەت ناکات.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ئەجرو پاداشت بەبێ ملکەچی‌و سەرشۆڕی، ئەگەر لەخەودا قیامەت‌و پێغەمبەرانی بەدیکرد خەڵکی روویان تێدەکەن لەڕۆژی قیامەتدا بۆ شەفاعەت‌و بەڵگەیە لەسەر وەستانی حاڵ‌وبارو یارمەتیدانی پێداویستیداران لەکاتی بوونی پێویستیدا چونکە دەوەستن لەتکا بۆکردن‌و هەریەك دەڵێت: من ناتوانم شەفاعەت بکەم‌و بەتەنیا (محمد) (ﷺ) دانراوە بۆ ئەو کارە.

*ئەگەر دراوسێکەی شەفاعەتی بۆکرد بەڵگەیە لەسەرئەوەی سوودی لێوەردەگرێ‌و لەلایەن یەکێك لەهاوەڵەکانیەوە پشوودەدرێت، یاخود یارمەتیەك لەهاوکارەکانیەوە وەردەگرێ لەکاتی پێویستی‌و ناڕەحەتیدا.

*ئەگەر کوڕەکەی شەفاعەتی بۆکرد بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوودی لێوەردەگرێ یان سوود لەلای ئەوەوە رووی تێدەکات، هەروەها ئەگەر شەفاعەتی بۆ کەسانی تریشکرد بەو چەشنەیە.

*ئەگەر قورئانبوو بەتکاکاری سوود لەزانیاری وەردەگرێ‌و پلەوپایەیەکی زانستی بەدەستدەهێنێت.

**شەکر:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شایی‌و چاکبوونەوە لەنەخۆشی‌و رەواندنەوەی غەم‌و پەژارەو گەیشتن بەهیواو ئاوات‌و دوایی هاتنی سەرجەم کردارەکان یاخود خواردنی یابوون بەخاوەنی.

*ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر هاوسەر رێزدارو شۆخ‌و شەنگە.

*ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر کوڕ زیرەك‌و رێزدارو زانا دەبێت‌و هاوبەشی هەموو هونەرمەندێکدەبێ.

*ئەگەر بەڵگەبێت لەسەرماڵ‌و سامان حەلاڵ‌و پاکدەبێ.

*ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر زانیاری پاکدەبێت لەبیدعە.

*شەکر بەڵگەیە لەسەر ماڵ‌و دارایی.

* یـەك كلۆشـەكر ماچـێكە لەلایـەن خۆشەویستێكەوە یان كوڕەوە.
* چەند كلۆشەكرێك بەڵگەیەلەسەر وتـی وتی.
(ئیبن سـیرین) دەڵێت: شـەكر فرۆشـی خێـری تێـدا نییـە ، نـەبات بەڵگەیـە لەسەر دڵسۆزی لەوتەو كرداردا.
* دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر چاكبوونەوە لەنەخۆشی.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆشیو رزق‌و رۆزی لەرووەكەوە یان بارانبارین.
**شەللاق( قامچی ):** (نابلسی)دەڵێـت: بەڵگەیـە لەسـەر كەشـتیەوانیو تیروپشك.
**شـەلین ( لـەنگین ):** (ئـیبن سـیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی قاچی راستی شـكا یـان كەموكوڕییـەكی تێكـەوت ئەگـەر برینـداری پێوەبـوو كوڕەكـەی نەخۆشدەكەوێ، ئەگەر لەقاچی چەپیدا بـەدیكردو كـچی هـەبوو دەستنیشاندەكرێ، ئەگەر كـچی نـەبوو كچێكیدەبێت.
* ئەگـەر شـكانی قاچـی خـۆی بینـیو لەسەرسەفەربوو با نەجوولێ‌و لەشوێنی خۆی بمێنێتەوە ، ئەگەر تـەلاقی بخات ژنەكەی نەخۆشدەكەوێ.
* ئەگەر یـەكێك لەلاقـەكانی درێـژتر بـێ لەوی دی سەفەرێكدەكات.
* ئەگەر بینی شەلبوە یان لەجێی خۆی نـاتوانێ بجـووڵێ‌و هـەڵیناگرن لاوازی توانایـەتی لـەوەی داواخوازییـەوەو ملكەچكردنی ئەوەیە كەئەو ئەندامەی دەدرێتەپاڵ وەك خزم‌و كەسەكانی.
* هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی شـەلبوە ئـاینی باشـدەبێ‌و زانیـاری فێردەبـێ ، ئەگەر سوێندی خواردبوو زیـانی نابێـت بۆی، ئەمەش وتەی (ئیبن سیرین)ە.
* ئەگـەر پیاوێـك ژنێكـی لـەنگی بینـی كاروبـارێكی ناتـەواو بەدەسـتدەهێنێ، ئەگەر ژنێكیش پیـاوێكی لـەنگی بینـی بەهەمان شێوەیە.
* پیری لـەنگ بـاپیری خەوبینـەرە یـان هاوڕێیەكە كەموكوڕی هەیە.
* ئەگـەر مرۆڤێكـی بینـی بەیـەك قاچـدەڕوات بـەڕێوەو یـەكێكیانی خستوەتە سەرئەویتر نیوەی ماڵەكـەی دەشـارێتەوەو بەنیوەكـەیتر ئیـشوكار دەكات.
(نابلـسی) دەڵێـت: لـەنگی دەستبڕین‌و ناپاكی‌و خیانەتە.
هـەروەها دەڵێـت: بەڵگەیـە لەسـەر شاردنەوەی نازو نیعمەت‌و خۆ بەهەژارو رەجاڵ دەرخستن.

*هەروەها دەستبڕین‌و بەجێهێشتنی خانەوادەو هاوسەرو ماڵ‌و منداڵ‌و بەرپەرچدانەوەو نکوولیکردن لەخێروچاکە کوێری‌و تاڵیش وایە.

**شەمار**[1]: (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر پیاهەڵدان‌و ستایشی باش.

**شەمشەمەکوێرە**: (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کوێری‌و سەرگەردانی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کوڕێك لەزیناوە لەدایکبووبێ.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر خۆشاردنەوە بەهۆی کرداری خراپەوە وەك دزی‌و گوێگرتن.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر رەواندنەوەی نازو نیعمەت‌و دوورکەوتنەوە لەکاری ئاسایی.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر بەجێهێنانی سوننەت‌و بەڵگە چونکە موعجیزەی حەزرەتی (عیسا) (سەلامی خوای لێبێت).

(ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی خواناسی لێبڕاوە، یاخود ژنێکی جادووگەرە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی خواناس‌و لێبڕاوەو بەڵگەیە لەسەر بەتاڵ‌و رەواندنەوەی ترس‌و بیم، هەروەها بەڵگەی خێرو چاکەیە بۆ ئافرەتی دووگیان چونکە منداڵی دەبێت، بەلام بۆ موسافیر باش نییە گەر بەوشکانی یاخود دەریادا بڕوات.

*بەڵگەیە لەسەر:

+وێرانبوونی ماڵێك بەڵگەبێت لەسەری.

+پیاوێکی ستەمکاری بێبەش.

**شەو**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: شەووڕۆژ دوو دەستەلاتداری واژووی یەکن‌و داوای یەکدی دەکەن.

*شەو بێباوەڕەو ڕۆژیش موسوڵمان، چونکە تاریکایی دەرەوێنێتەوە، خوداوەندیش لەقورئاندا گوزارشتی لەبێباوەڕی بەتاریکایی کردووەو ئاینیشی بەنورو رووناکی باسکردوە.

*دەگونجێت هەردووکیان بەڵگەبن لەسەر دوو نەیارو زیان.

*دەگونجێت شەو بەڵگەبێت لەسەر مارەبڕین‌و ڕۆژیش بەڵگەبێت لەسەر تەلاقدان.

*دەگونجێت شەو بەڵگەبێت لەسەر بازاڕساردی‌و پشووی پیشەوەرو

---

[1] **شەمار**: روەکێکە گوڵێکی زەرد دەردەکات.

(فەرهەنگی دەریا: ب١/ ٥١٩)

سەفەرکاران، ڕۆژیش بەڵگەبێت لەسەر دووڕوویی و جموجووڵی بازاڕو نرخ.

*دەگونجێت شەو بەڵگەبێت لەسەر زیندان چونکە تاریکاییەکەی مرۆڤ بۆ هەندێك كار پابەنددەكات ، ڕۆژیش بەڵگەیە لەسەر قوتاربوون.

*دەگونجێت شەو بەڵگەبێت لەسەر دەریاو ڕۆژیش لەسەر چاکە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مردن ، چونکە خوداوەند روحی زیندەوەران بەنوستن دەکێشێ و بەڵگەیە لەسەر زیندوبوونەوە.

*دەگونجێت هەردووکیان بەڵگەبن لەسەر دووگەواهیدەری دادپەروەر، چونکە گەواهی و شاهیدی دەدەن بەسەر دروستکراوەکانەوە.

*ئەگەر بینی ڕۆژ بوەتەوە گەرنەخۆشبوو نەخۆشیەکەی بەمەرگ یان چاکبوونەوە دەڕەوێتەوە.

*ئەگەر لەکاتی بەیانیدا بەرنوێژی بۆ خەڵککرد یاخود چوو بۆ سەفەر یاخود بۆ(حەج)یان بەرەو بەهەشت چوو مردنیەتی و بەڵگەی باشەیە لەسەر خێرو ڕووناکی گۆڕستان بۆی.

*ئەگەر ئاوی هەڵگۆزت یان خواردنی کۆکردەوە یاخود جۆیکڕی ڕۆژ دەروە لێیدەکرێتەوە ، ئەگەر زیندانیەك بینی لەزیندان ئازاددەبێ، ئەگەر ڕێگەلێگیراوی سەفەری وشکانی و دەریابوو دەرووی لێدەکرێتەوەو ڕێگەی بۆ دەگرێتەوە.

*ئەگەر پیاوێك بینی هاوسەرەکەی لێی یاخیبوبوو لەیەك جیادەبنەوە، چونکە ڕۆژ هەردووکیان لەیەك جیادەکاتەوە.

*ئەگەر گوناهکارێکی بێئاگا بینی یان بێباوەڕێکی ئارەزووبار تەوبەدەکات و لەبێئاگایی و بێدار دەبێتەوە.

*ئەگەر بێبەش یان بازرگانێك بینی بازرگانیەکەی سستی ڕووی تێکردبوو بازاڕساردی هاتبوو بەسەریا دیسان بازاڕی گەرم دەبێتەوە.

*ئەگەر یەکێك بینی دوژمنێکی بێباوەڕی هەبوو یا نەیارێك زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکەیداو حەق و ڕاستی بەسەریا پیادە دەکات.

*ئەگەر کۆمەڵێ خەڵك بینیان لەنەبوونی و قات و قڕیدابوون یان ستەم و فیتنە ڕووی تێکردبوون ڕزگاریان دەبێت لەو نارەحەتیە.

*هەروەها هاتنی شەو بەسەر ڕۆژدا بەواژووی ڕۆژ دادەنرێ و هەرکەسە بەپێی خۆی بۆی لێکدەدرێتەوە.

*ئەگەر بینی دنیا هەموو کات شەوە خەڵکی ئەو ناوچەیە هەژاریو برسێتیو مردن روویان تێدەکات.

*ئەگەر بینی هەرشەوەو هەسارەکان بەدەوری ئاسماندا دەسووڕێنەوە خەڵکی ئەوجێیە لەلایەن بەرپرسەکانەوە زوڵمو ستەمیان لێدەکریٚ.

*تاریکایی ستەمو گومراییە ، ئەگەر هەورە بروسکەو گرمەی لەگەڵدابوو کاریگەرترە.

*هەندێکدەڵێن: هەڵهاتنی رۆژ بەڵگەیە لەسەر:

+خۆشحاڵی.

+دڵنیایی.

+دەرووی خێرو قوتاربوون لەناڕەحەتی.

*سەرەتای رۆژ بەڵگەیە لەسەر سەرەتای کاروبار خەوبینەر شوێنی دەکەویٚ، نیوەڕۆش بەڵگەیە لەسە نیوەی کاروبارەکانو، کۆتایی رۆژ بەڵگەیە لەسەر کۆتایی کاروبار.

*ئەگەربینی شتێکی لێونبووەو دۆزییەوە لەکاتی رۆژهەڵهاتنم بەسەر نەیارەکەیدا دەچەسپێنیٚ لەکاتێکدا نکووڵی لێدەکات بەگەواهی گەواهیدەران بەپێی ئایەتی: ﴿إِنَّ قُرآنَ الفَجرِ كَانَ مَشْهُوداً﴾ (الإسراء:٧٨).

*ئەگەر بینی هەموو سەردەم هەر رۆژەو شەوی تێدا نییەو رۆژیش ئاوا نابیٚ بەڵکو بەدەوری ئاسماندا دەسووڕێتەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەستەلاٚتدارو فەرمانڕەوا بڕیاری خۆی زاڵدەکاتو پرسو راوێژ بەکەس ناکات.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر بێکاری، ئەگەر بینی سەردەمو کات هەمووی شەوە بژێوی رادەوەستیٚ، ئەمەش لەکاتێکدا ئەگەر شەو روناکی مانگی تێدا بەدی نەدەکرا.

*دەگونجێت شەوورۆژ بەڵگەبن لەسەر نزیکبوونەوەی دوور لەخێر یان شەڕ چونکە هەموو شتێکی نوێدەهێننو دوورنزیکدەخەنەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبن لەسەر:

+ئامۆژگاری.

+رەوشتو ئادابەکان.

+کەوتنە نێو ئەو حاڵەی پەشیمانی لەدواوە بێت.

*دەگونجێت بینینی شەو بەڵگەبێت لەسەر گۆڕانو هەڵگەڕانەوەی رۆژگارو رووداوەکانی.

*شـەو بەڵگەیـە لەسـەر ژنـی رەش‌و رۆژیـش لەسـەر ژنـی سـپی‌و دووگیـانی ژن.

*بینینـی شـەو بەڵگەیـە لەسـەر جل‌وبـەرگ‌و هـی رۆژیـش لەسـەر رزق‌و رۆزی‌و بژێوی.

*دەگونجێـت بینینـی شـەو بەڵگـەبێت لەسـەر شـاردنەوەی کاروبارەکـان‌و دڵنیـابوون لـەترس مەگـەر خەوبینـەر لەسـەفەردابێ ئـەوجا شـەو بەڵگەیـە لەسەر ستەمێك دێت بەسەریاو بەڵگەیـە لەسەر سوێند بەپێی ئایەتی: ﴿واللیل إذا یغشی﴾ (اللیل: ١).

*هـەروەها شـەو بـۆ خواناسـان‌و شەونوێژکاران بەڵگەیە لەسەر :

+مامەڵە.

+گەیشتن بەهیواو خواز.

+کۆبوونـەوە لەگـەڵ ئەوانـەی ئـاوارەو غەریبن.

*ئەگەر شەوی لەخەودا بینی یان خۆی لەشەودا بینیەوە لەسەر بارێکی بێئاگا بەڵگەیـە لەسـەر رەوانـدن‌و تیاچـوونی نازونیعمـەت‌و بـەلاو کارەسـاتی رووداوەکان.

*بینینـی شـەوانی روونـاك‌و پرشـنگدار وەك شـەوی(قـەدر) لەخـەودا مـژدەی خێرە.

*ئەگـەر داوای گـەنج‌و سـامانیدەکرد بەدەستیدەهێنێت.

*هـەروەها بینینـی شـەوی پـانزەی (شەعبان)و شەوی (ئیسرا- شەورەوی)و شەوی (هەینی) بەهەمان شێوازە.

**شـەوبێداریی:** (نابلـسی) دەڵێـت: لەخەودا خۆشویستنی دروستکراوەکانە لەخانـەوادەو کـوڕ خۆشەویـست‌و بەڵگەیـە لەسـەر جیابوونـەوە لەخۆشەویستان.

*ئەگـەر بینی بـەردەوام شـەوبێدارەو نانوێـت لەخۆشەویـستانی دادەبـڕێ‌و جیادەبێتەوە.

**شەوق پەیداکار:** (نابلسی)دەڵێت: بـۆ قاپ‌و قاچاخی شکاوو بینینـی بەڵگەیە لەسـەر باشـی حـاڵ‌و بـارو پاراسـتن لەنەخۆشی‌و گرتنەوەی شوێنی شکاو.

**شـەوگەرد:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: شـەوگەرد مرۆڤێکـە خراپـە لـەنێو خەڵکیدا بڵاودەکاتەوە، ئەگـەر کوشـتی زەفەر بـەمرۆڤێکی لـەو چەشـنەدەبات، ئـەوەی گۆشـتەکەی بخـوات بـەلێنراوی مـاڵی ئـەو مرۆڤـە دەخـوات ، ئەگـەر بۆگەنبوو غەیبەتیدەکات.

**شـەونم:** (نابلـسی)دەڵێـت: بەڵگەیـە لەسەر مژدە.

**شەیپور ( هۆڕن - زوڕنا ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی ببینێ شەیپوڕ لێدەدات خێـر رووی تێـدەکاتو ئەگـەر گـوێی لێبوو یەکێکیتر لێیدەدا بانگدەکرێت بۆ جەنگو بەربەرەکانی.

(نابلسی) دەڵێـت: لەخـەودا ناوبـانگی بـاشو چـاکەو ترسـانی دوژمنـە یـان جەنگـە، ئـەوەی لەخـەودا دەنگـی شـەیپور ببیـستێ بانگـدەکرێت بـۆ رووداوو کارەساتێك.

*ئەگـەر بینـی فـووی پێـدا دەکـات رووداوێك دێت بەسەریدا.

*شـەیپور خزمـەتکارە لەگـەڵ دەستەلاتداری ئەگەر شاخی لەگەڵدابوو یان پێوەیبوو.

*شـەیپوور بەڵگەیـە لەسـەر هـەواڵی بـەتاڵو پـووچ ، شـەیپوور لێـدەریش بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی مەیفرۆش یان پیاوێکی بێکەڵكو سووك .

*شەیپوور بەڕەوشتی ژن لێکدەدەنەوە ئـەوەی کـەمو کـوڕیو ناتـەواوی لەشـەیپورەوە ببینـێ دەدرێتـە پاڵژنەکەی.

*دەنگی شـەیپور یان زوڕنـا : ئـەوەی لەخـەودا دەنگی شـەیپور ببیـستێ بـۆ کارەسـاتو رووداوێـك بانگـدەکرێت، ئەگەر خۆی فووی پێداکرد رووداوێکی توندوتیـژ روودەدات یـان ئەگـەر شەیپوری لێدا هەواڵێکی خۆشو پڕ خێر دەبیستێ.

**شـەیتان:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: شـەیتان دوژمنـە لـەئاینو دنیـاداو قـوڵبڕێکی فێڵبـازەو گوێنـادات پێـی بـەهیچ شـتێكو لێکدانـەوەی بەدەستەلاتداردەکرێ یان دەگونجێت بەخانەوادە لێکبدرێتەوە.

*ئەگـەر بینـی شـەیتان دەسـتی لێوەشاند لەکاتێکدا سەرقاڵی یادی خوابـوو خەونەکـەی بەڵگەیەلەسـەر ئەوەی دوژمنی زۆری هەیەو دەیانەوێت تیاییەرن ، بەلاَم ناتوانن ویستی خۆیان بەدەسـتبهێنن بـەپێی ئایـەتی: ﴿ انَّ الذينَ اتَقَـوا اذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّروا ﴾ (الأعراف: ٢٠١).

*ئەگەر بینی بریسکێکی داگیرساو نرا بەشـەیتانێکەوە خەونەکـەی بەڵگەیـە لەسەر دروستی ئاینەکەی.

*ئەگـەر بینـی شـەیتان ترسـاندی خەونەکـەی بەڵگەیـە لەسـەر دڵسۆزی لەئاینەکەیـداو دڵنیـایی لـەوەی پێـی ترسێنراوە بەبەڵگەی ﴿ فَلاَ تَخَافُوهُم وَخَافُونِ انْ كُنْتُم مُؤْمِنِين ﴾ (آل عمران: ١٧٥).

*ئەگـەر خۆشـیو شـادی بینـی سەرقاڵدەبێت بەئارەزووحەزەوە.

*ئەگەر بینی شەیتان جلوبەرگەکەی لێداماڵی لەکارو پۆستەکەی لادەبرێ ، ئەگەر دەستەلاتداربوو یاخود زەوی و زاری لێدەسەنرێ بەپێی ئایەتی: ﴿ يَا بَنِي آدَمَ لاَ يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ ﴾ (الأعراف: ٢٧).

*ئەگەر بینی شەیتان دەستی لێوەشاندوە دوژمنێکی هەیەو هەوڵی لەخشتەبردنی ژنەکەیدەدات.

*هەروەها دەڵێن: ئەم خەونە بەڵگەیە لەسەر دەرووکردنەوە لەخاوەنەکەی و رەواندنەوەی غەم و پەژارەو چاکبوونەوە لەنەخۆشی بەپێی ئایەتی: ﴿ وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أيوبَ اذْ نَادَى رَبَّهُ أني مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ﴾ (ص:٤١).

*ئەگەر بینی شەیتان شوێنیکەوتوە دوژمنێکی هەیە دەستیدەبڕێت و لەخشتەیدەبات یان لەکارو پلەوپایەی کەمدەکاتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿فَأتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الغَاوِينَ ﴾ (الأعراف: ١٧٥).

*ئەگەر بینی بوە بەخاوەنی شەیتان و شوێنی کەوتوەو رامبوە بۆی پلەوپایەو هەیبەت و زاڵبوون بەسەر دوژمنەکانیدا بەدەستدەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿وَمِنَ الشَيَاطِينِ مَنْ يَغُوصُونَ لَهُ﴾ (إبراهيم:٤٩).

*ئەگەر بینی شەیتانێك هاتەخوارەوە بۆلای گوناهو تاوانێك ئەنجامدەدات و درۆیەکدەکات بەپێی ئایەتی: ﴿ تُنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴾ (الشعراء:٢٢٣).

*ئەگەر بینی گفتوگۆ لەگەڵ شەیتاندەکات راوێژ بەدوژمنەکانیدەکات و لەنێوچاکەکاراندا ناویاندەبات بەڵام ئەوان ناتوانن بەو بەرگەوە دەربکەون بەپێی ئایەتی: ﴿إنَّمَا النَّجْوَى مِنَ الشَّيْطَانِ لِيَحْزُنَ الذِينَ آمَنُوا ﴾ (المجادلة: ١٠).

*ئەگەر بینی شەیتان فێری گوفتاریدەکات و بەقسەیەکی خراپ دەدوێت یان پلان لەخەڵکی دەگێڕێ یاخود شیعری درۆ هەڵدەبەستێ.

*ئەگەر بینی (ئیبلیس)ی کوشت فروفێڵدەکات و (دەجال)یش مرۆڤی دەستبڕەو خەڵکی پێ فریوودەخۆن.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی شەیتان خۆشی و ئارەزووە هەروەك چۆن ئارەزوو لەوزە دەرچوون و شەیتانییە.

*ئەگەر بینی شەیتان دەستی لێوەشاند سوو دەخوات.

*ئەگەر بینی دژایەتی شەیتان دەکات پیاوێکی باوەڕداری راستگۆیەو گوێڕایەڵی پەروەردگار دەکات لەئاینەکەیدا توند دەبێ.

*ئەگەر بینی بریسکێکی داگیرساو دوای شەیتانکەوتوە لەو گەڕەکەدا پیاوێکی تێدایە دوژمنی خوداوەندەو بۆ دەستەلاتدار ئاگاداری نهێنیەکانی پادشا دەبێت‌و بۆ دادوەریش تووشی بەلاو نەهامەتی‌و تۆڵەو سزای خوایی دەبێت.

*ئەگەر بینی شەیتانیکردووە بەدوژمنی خۆی ئایندارو گوێڕایەڵیە بۆ پەروەردگارەکەی.

*ئەگەر بینی شەیتانێك خۆیکردوە بەنێو لاشەیدا یان شەیتان هەڵیلوشیوەو کردوویەتیە نێو سکی، ئەگەر لەسەفەردابوو بەدەریادا ترسی شکانی کەشتیەکەیانی هەیە، ئەگەر لەوشکانیدابوو خراپەی پێدەگات.

*دەگونجێت بینینی شەیتان بەڵگەبێت لەسەر بیناسازان‌و رۆچوون‌و سیخوڕو گوێگران.

*دەگونجێت بینینیان بەڵگەبێت لەسەر چاوداگرتن‌و ئاماژەکردن.

*ئەگەر بینی بوە بەشەیتان رووی گرژکردوە بەبینینی مرۆڤو دەستپێشخەریکردوە بۆ دژایەتیان یاخود دەبێت بەوەستای بۆری‌و بەلوعە.

*دەگونجێت بەسووتاوی بمرێ یان لەئاینەکەی ساردبووبێتەوە.

شەیدایی: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا سەرمایەیە لەدنیاداو دەرەنجامی خێروباشە.

## ش ی

**شیث** (سەلامی خوای لێبێت): (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر (شیثی) بینی ئەو ماڵ‌و سامان‌و منداڵ‌و ژنێکی خۆشنوودی دەستدەکەوێ. ئەگەر (ئیدریس)ی بینی بەڕێزداری‌و کۆتایی خێرو چاکەی پێدەدرێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا خۆشی‌و شادیی‌و منداڵ‌و ژینێکی خۆشنوودی پشت بەخودا پێدەبەخشرێ لەگەڵ رێزو بژێوی باش.

*هەروەها دەڵێن: ئەوکەسە دەبێت بەچاودێری کەسێکی مەزن یان کاروباری مەزن دەگرێتە دەست‌و بەباشی بەجێیدەگەیەنێ چونکە (شیث) یەکەم جێگرو چاودێربوە لەسەر زەوی.

**شیر**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: "ئەگەر بینی شیردەخواتەوە ئەوە لەپاکییەتی".

*(ئەبوسەعد)دەڵێ: بینینی شیر لەهەردوو مەمکدا بۆ پیاوو ژن

ماڵوسامانەو جووڵاّنو هاتنە دەرەوەی فراوانیو گوشادی ماڵوسامانە.

*ئەگەر ژنێك بینی شیر بەمنداڵ یان پیاو یاخود ژنی ناسراو دەداتو لەبێداریشدا شیری نەبوو دەروازەکانی دنیا بەڕووی خۆیو ئەوانەی شیری پێداون دادەخرێ.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر بینی شیر دەدات بەژنێك ماڵو سامانو سوودو قازانج بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی شیری ئەسپو حوشتر دەخواتەوە فەرمانڕەوا خۆشی دەوێتو ماڵوسامانی لێوە بەدەستدەهێنن.

*شیری ئاژەڵ ماڵێکی حەلاڵە لەدەستەلاّتدارەوە.

*ئەگەربینی شیر کرا بەسەریا لەمرۆڤێکەوە بەڵگەیە لەسەر تەنگی حاڵوبار، بۆشیرخۆرو شیردەریش هەرکامێکیان ناسراوبوون حاڵی لەکاتی بەندکردندا توندترە لەنادیار.

*شیر ماڵێکە بەماندووبوون بەدەستدێت.

*دۆشین لەلێکدانەوەدا فرۆفێڵە، دۆشینی حوشتر کرێکارییە، هەروەها ئەگەر دۆشینیو خوێنی لێهات لەدەستەلاّتەکەیدا ستەمدەکات.

*ئەگەر بازرگانێك دۆشیو شیربوو رزقێکی حەلاڵو سوودو قازانج لەبازرگانیەکەیدا دەکات بەئەندازەی لێهاتنی شیر.

*ئەگەر حوشترێکی دۆشیو شیرەکەی خوارد بەڵگەیە لەسەرئەوەی ژنێکی باشدەهێنێت، ئەگەر هاوسەرداربوو کوڕێکی دەبێت بەفەڕو خێردەبێ.

*شیری مانگا فەڕوپیتی ساڵە لەگەڵ ماڵی حەلاڵو گەیشتن بەسروشت.

*هەروەها وتراوە: ئەگەر خەوبینەر هەژاربوو دەوڵەمەنددەبێ.

*شیری مەڕو بزن: بەدەستهێنانی ماڵێکی حەلاڵە ئەگەرشیربوو.

*شیری شێر: زاڵبوونە بەسەر دوژمندا ئەوەی کەدەیخواتەوە.

*هەروەها دەڵێن: ماڵ لەلایەن دەستەلاّتداری ستەمکارەوە بەدەستدەهێنێ.

*شیری سەگ: ترسوبیمێکی سەختوگرانەو هی گورگیش بەهەمان شێوازە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەدەستهێنانی ماڵوسامان لەلایەن ستەمکارێکەوە.

*شیری بەراز: گۆڕانی ئەقڵو ژیری خاوەنەکەیەتی.

*هەروەها دەڵێن: زۆرێکی ماڵی حەرامەو کەمێکیش حەلاڵە ، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ اضْطُرَّ غَيْرَ باغٍ وَلاَ

عَـــادٍ فَـــلاَ إِثْـــمَ عَلَيْـــهِ﴾ (البقرة::١٧٣).کەمێکی تایبەتکردووەو زۆرێکی حەرام.

*شـــیری پڵـــنگ: **دەرخـــستنی دوژمنایەتییە.**

*شیری ئاسك: **ئاگادارییـه ، شـیری گوێدرێـــژی کێـــوی نەخۆشـــییەکی سووکە.**

***رزق و رۆزییەکی کەمە.**

*شیری درندەکان: **هێزە لەئایندا.**

*شیری مەڕو گامێش: **خێرو سروشتە.**

*شـیری ورچ: **زەرەرو غـەمو پـەژارەی خێراو کتوپڕە.**

*شـیری پـشیلە: **نەخۆشـیەکی ئاسانە یان شەڕو پێکدادانە.**

*شـیری ئەسـپ: **بۆیـەکێك بیخواتـەوە ناوێکی باشە بۆ خەوێکی.**

*شیری ماکەر: **بەدەستهێنانی خێرە.**

***دەرکـــەوتنی شـــیر لەســـەر زەوی بەڵگەیە لەسەر ستەمو زۆرداری.**

* **شـــیری ئەوگیاندارانـــەی کەشـیریان نییـە: بەدەسـتهێنانی هیـــواو ئاواتـــەو لەلایەکـــەوە کەچاوەڕێینەکردوە.**

***ئەگـــەر مـــرۆڤ دۆزییـــەوە دەگـــات بەخواستو هیوای خۆی.**

***شـیرخواردنی مـرۆڤ لەمـەمکی خـۆی بەڵگەیە لەسەر ناپاکی.**

*شیری ئەو درندانەی دەگەزن: **چاکی نێوان خۆی‌و دوژمنانیەتی.**

***ئەگـەر لەشـیری مـاریخوارد کارێـك ئەنجامـدەدات خوداوەنـد رازیـدەکات. هـەروەها دەڵـێن: ئـەوەی بیخـوات دەرووی لێدەکرێتـــەوەو لەنەهامـــەتی قوتـــاردەبێ‌و مـــاڵێکی کـــۆکراوی بەسوودە.**

**(نابلـــسی)دەڵێـــت: لەخـــەودا شـــیر فـــیترەت‌و پـــاکی ئیـــسلامەو مـــاڵ‌و سامانێکی حەلاڵە بەبێماندوبوون.**

*شـیری هـەڵبزرکاو: **مـاڵێکی حەرامـە بەهۆی ترشی‌و چەورییەوە.**

***ئەگـەر ژن یـا پیـاوێکی بینـی شـیر لەمەمکیدابوو ماڵ‌وسامان کۆدەکاتەوە، ئەگـەر هـەردوو مـەمکی بینـی شـیریان لەبەردەڕۆیی ئەوا دنیا رووی تێدەکات.**

*شیری دەڵەسەگ: **ئەگـەر خوردایەوە پلەوپایەی بەسەر خەڵکی ئـەو شارەدا دەستگیر دەبێ.**

*شـیری درنـدەکان: **هـەمووی گومانـە لەئایندا.**

*شـیری گوێدرێـژی کێـوی: **نەخۆشـییە دوای چاکبوونەوە.**

*شـــیری مـــرۆڤ: **گـــرتن‌و زیندانییـــە بۆشیرخۆرو شیردەر.**

***ئەگەر بینی شیردەرێکی بەکرێگرت هەتا شیر بدات بەکوڕەکەی کوڕەکەی لەسەرڕەوشی خۆی پەروەردە دەکات.**

*شیری ڕێوی: **رزقێکی کەمە لەقەرزەوە بۆ خەوبینەر دەگەڕێتەوەو وتراویشە چاکبوونەوەیە لەنەخۆشی.**

*شیری مەڕ: **ماڵێکی پیرۆزە.**

*شیری مانگا: **دەوڵەمەندییە.**

*شیری هێستر: **توندیو قورسیو نارەحەتییە.**

*شیری بەراز: **بەدەستهێنانی ماڵو سامانێکی مەزنە.**

*شیری نەوەی ئادەم: **بۆنەخۆش شیفایە چونکە هێزو نەشونمای پێدەکات.**

***ئەمانەتەو نابێت هەڵسوکەوتی پێوەبکرێ.**

*شیری سەگ و پشیلە: **نەخۆشی یان ترسو بیمە.**

***ئەگە شیرەکەی رشت تیادەچێت.**

***شیر بەڵگەیە لەسەر ماڵوسامانو تەمەندرێژیو دەرکەوتنی زانیاریو یەکتاپەرستی هەروەها بەڵگەیە لەسەر چارەسەرو رزقو رۆزیو خاوەنی ئاژەڵ یان نواندنی رەوشی ئەو.**

*شیری مانگاو مەڕو حوشترو گامێش: **هەموو ئەوانە ماڵێکی کۆکراوەو شیری بزرکاویش غەمو پەژارەیە.**

***هەروەها گوتراوە: شیری پشیلەو رێوی خراپەیە.**

*شیری ئاژەڵی نادیاری درندە: **شکۆمەندیو چوستو چالاکییە بۆ نەخۆشو ئازادبوونە لەزیندان یاخود ماڵوسامانێکی زەوتکراوە.**

**شیرا**[1] **: (نابلسی) دەڵێت: نەخۆشیەکی خوێناوییەو بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندییەکی کتوپڕو خێراو خۆشی هەڵگر، هەروەها خراپەو ئامادەکردنی سزایە.**

**شیردان: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر ژنێك بینی شیردەدات بەمرۆڤێك داخستنی دەروازەکانی دنیایە بەڕوویدا، چونکە شیردەر وەك زیندانی وایە بەمەرجێك منداڵ مەمکی لەت نەکات ، لەبەرئەوەی مەمکەی لەدەمی منداڵدایەو ناتوانێت وای لێبکات ، بەهەمان شێوە ئەوەی هەڵدەستێت بەمژینی شیر هەرکەسێك بێت منداڵ یان پیاو یاخود ژن، ئەگەر شیردەر دووگیان بوو ئەوا پارێزراو دەبێت.**

**(نابلسی) دەڵێت: شیردان لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پێویستیو گۆڕانی حەزو ئارەزوو، ئەگەر ژنێك بینی شیردەدات بەمرۆڤێك داخستنی دنیایە**

---

[1] **شرێ:** نەخۆشیەکی خوێناوییە. (وەرگێڕ)

بەڕوویانــدا یــاخود زیندانیکردنیانــە چونکە شیردەر وەك زیندانی وایە هـەتا شیرخۆر مەمکی بەردەدات.

*ئەگـەر بینـی شـیردەدات بەمنـداڵێك دوای بڕینەوەی زیندانیـدەکرێت یاخود نەخۆشــدەکەوێ یــا دەروازەیــەکی لێدادەخرێ، ئەگـەر ژنـی دووگیـانبوو پارێزراودەبێت لەگەڵ منداڵەکەی.

*ئەگـەر بینـی شـیر لەمەمکیدایـە روو لـەدنیادەکات لەکاتێکـدا دنیـا پـشتی تێدەکات و بەسەردەچێت.

*ئەگـەر ژنێـك بینـی پیاوێـك شـیری دەخــوات لــەماڵ و دارایــی دەبــات بەئەنـدازەی ئەوشـیرەی خواردوویـەتی لەکاتێکدا ژنەکە پێی ناخۆشە.

*ئەگەر بینی دەگەڕێت بەسـەر ژنانـداو شــیری دەدەنــێ بــەلام شــیری دەستناکەوێت منداڵ پەسەنددەکات.

*ئەگـەر نەخۆشـێك بینـی شـیردەدات لەنەخۆشییەکەی چاکدەبێتەوە چـونکە بەشیر نەش‌ونمایکردووە.

**شیرفرۆش:**(نابلسی)دەڵێـت: لەخـەودا بینینی بەڵگەیە لەسـەر زانیـاری و رزق و رۆزی حەلاڵ و رێنومایی.

**شیرەوان:**(ئیبن سیرین )دەڵێت: ئەگـەر شـیری وشـککردو کـۆیکردەوە مـاڵ و سامان کۆدەکاتەوە.

*ئەگـەر رۆیـی تێیـداو تـەڕبوو غـەم و پەژارەو ناڕەحەتی تووشدەبێ.

**شیرینـساز( شیرینـچی )**:(ئـیبن سـیرین) دەڵێت: پیـاوێکی نـەرم و نیانـە، ئەگـەر بینــی شــەکر دەفرۆشــێ و بــەهاو نرخەکەی بەدرهـەم وەردەگـرێ قسەی نــەرم‌ونیان لەگــەڵ خەڵکیــدەکات و ئەوانیش وەك خۆی وەلامیدەدەنەوە.

**شیرینی( حەڵوا )**:(ئیبن سیرین)دەڵێـت: حــەڵوای وشــك مــاڵ و دارایییەکــە بەناڕەحەتی دەستدەکەوێت ، حـەڵوای چـەوریش جیـاوازی هەیـە لەبارەیـەوە هەندێکــدەڵێن: بەڵگەیــە لەســـەر نەخۆشـی، هەنـدێکیتر دەڵـێن: مـاڵێکی زۆرە، لەگـەڵ ئـاینێکی پـاك و پوخـت، پاروویــەك لێــی ماچــی کــوڕ یــا خۆشەویـستێکە ، هەنـدێکیتر دەڵـێن: حــەڵوا قــسەو وتــەی نەرم‌ونیانــە سەبارەت بەبژێوی و رزق و رۆزی.

*هــەروەها بەڵگەیــە لەســـەر رزق و رۆزییەکی زۆر لەگەڵ هێز و دەستەلات.

**شیشی گۆشت برژانـدن:**(ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: شیـشی گۆشـتبرژاندن بـژێوی پەیداکاری ماڵە.

*هــەروەها دەڵــێن: خزمــەتکارێکی خاوەن دەستەلاتە بەهۆیـەوە دەگـەیت بەویست و خواز.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی پێداویستی لەلای فەرمانڕەواو میانەڕەویو خێرو رزقو رۆزیو پشوو.

**شیعر (هۆنراوە)**: (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا شیعر دەڵێتو دەیەوێت پارەی پێپەیدابکات شەهادەی درۆو ساختە دەدات.

*ئەگەر بینی هۆنراوەیەك لەكۆڕێكدا دەخوێنێتەوە داناییەكە روو بەدووڕوویيە.

*ئەگەر گوێی لەشیعربوو ئامادەی كۆڕی وادەبێت هیچ حەقێكی تێدا ناوترێ.

*شیعر لەخەودا قسەو وتەیەكی بەتاڵە، ئەوەی گوێی لەشیعر بێت لەخەوداو لەبەریبكات باواتاكەی وەربگرێ.

*دەگونجێت شیعرنووسین لەخەودا یالەبەركردنی بەڵگەبێت لەسەر تیاچوونی پلەوپایەو كەمو كوڕی لەئایندا.

*دەگونجێت بینینی شیعرو هۆنراوە بەڵگەبێت لەسەر پیشەسازی بەرزو بەنرخ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو رەخنەگرتن لەئابرووی دوژمنان.

*ئەگەر لەخەودا شیعرێكی خراپی دانا وەك جنێودان بەكەسێك بەڵگەیە لەسەر تومەتباركردن ، ئەگەر پیاهەڵدانو هەژار دەكەویٚ گەردەوڵەمەندبێت.

*ئەگەر هۆنراوەكە ئاوازداربوو یان كێشەكەی ناتەواوی تێدابوو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر وتەی هەڵەتو خراپو دەوەستیٚ لەوەی دەیڵیٚ یان دەیكات یاخود ئەو وەسوەسەیەی تووشیدەبێت.

**شیكەرەوە( هەلاج )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: خاوەن شەڕو ئاژاوەیەو لەسەردەستی ماڵو سامان پەیدا دەبیٚ.

*ئەگەر بینی خەریكی شیكردنەوەیە دەچێتە نێو بەربەرەكانییەوە.

*ئەگەر نەیدەزانی بەباشی شیبكاتەوە نەیارەكانی زاڵدەبن بەسەریا.

**شیلاقە**[1]: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا رزقو رۆزیو باشەیە، هەروەها دەڵێن: پیاوێكی دووروە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر دوورخستنەوەی غەمو پەژارەو لەناكاو دەركەوتنی دوژمنو بەجێهێنانی بڕیار.

---

[1] **شیلاقە**: باڵندەیەكە بەئەندازەی كۆترەباریكە دەبێت. (وەرگێڕ).

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ناسوپاسگوزاری نازو نیعمەتو بەسەرچوونی پلەوپایەو ژینی ناخۆشو ئاڵۆز.

**شیلان(گەوهەری شەوچرا، عەنناب)**[٢]: هەندێکدەڵێن: ماڵو سامانێکی بێشومارە لەگەڵ کیژێکی شۆخو شنگ.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: شیلان شتێکی پیرۆزەو هەزاری دووردەخاتەوە هەروەك دەگێڕنەوە لەپێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر بینیتان مۆری پێدەکەن دەبن بەخاوەنی شتێکی پیرۆزو نازو نیعمەتێکی گەشەسەندو بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بوو بەخاوەنی شیلان هەژاری لێدووردەکەوێتەوە، هەروەها لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: "شیلان هەژاری دووردەخاتەوەو یەکەم بەردە دانی نا بەیەکتاپەرستی خوداوەندا".

**شینوزاری:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر شوێنێکی بینی شینوزاری تێدا ئەنجامدەدات لەو شوێنەدا کارێکی بەدو خراپ روودەدات هاوەڵانی لێدوور دەکەوێتەوە.

*هەروەها وتراوە لێکدانەوەی شینوگریان دەنگو ئاوازە.

*ئەگەر بینی مرۆڤێك دەمرێ دەیناسیو شیوەن دەکات بەسەریا بەلاو نەهامەتی روودەکاتە ئەوکەسە یان وەچەکانی.

*ئەگەر بینی شیوەن بۆ بەرپرسێ دەکەن مردوەو جلوبەرگەکەیان دەدڕێننو خاكو خۆڵدەدەن بەسەری خۆیاندا دەستەلاتدارە ستەمدەکات لەفەرمانڕەواییەکەیدا.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ئامۆژگاریدەر ، بینینی گریان بەڵگەیە لەسەرکردنەوەی لایەك بۆگەنی لێوە بلاوببێتەوە.

*هەروەها وتراوە شیوەنو زاری دەنگی سەگە.

*دەنگی لالانەوە دەنگی ئاگرو دەفە، دەگونجێت بەڵگەی شایی بێت.

*شینو زاری بۆ لووسکەلە باش نییە لەهەموو حاڵو بارێکدا.

*ئەگەر گریاو ئاشکرایکرد بۆ مردوویەك ئەگەر ناسراوبوو لەجێنشینەکانی مردوە بەلاو نەهامەتی رووی تێدەکات.

*ئەگەر شیوەنو زاری بۆ مردوویەك کرد یان غەمو پەژارەیەکی سەختی بۆ

---

[٢] **شیلان:** جۆرە میوەیەکی سوورە. (وەرگێڕ).

خـوارد بەڵگەیـە لەسـەر شـایی‌و خۆشحاڵی.

*شـین‌و زاری هەڵگیرسـانی فیتنـەو ئاشـووبە لەلایـەن شـینکارەوە، دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەروێڵی‌و سـەرگەردانی یـان پاشـگەزبوونەوەی لەئایندا.

*هـەروەها بینینـی بەڵگەیـە لەسـەر گۆڕانی حـاڵ‌و بـارو وێرانبـوونی لانـەو کـرداری خـراپ بـەپێی فـەرموودەی "شـین‌و زاری لەرەفتارەکانـدا وادەی نەزانینە"[١].

**ش ی**

**شێتی**: (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: شـێتی مـاڵ‌و داراییەکـە خەوبینـەر بەدەسـتی دەهێنێـت بەئەنـدازەی شـێتیەکەی‌و خەرجیـدەکات‌و دەیبەخـشێ لەگـەڵ هاوەڵێکی خراپدا.

*هـەروەها دەڵـێن: شـێتی پۆشـتەو پـەرداخ بوونـە بـەهۆی میراتییـەوە، یاخود بەدەستهێنانی دەستەڵاتە ئەگەر شایـستەی بێـت، شـێتی منـداڵیش دەوڵەمەنـدی باوکیـەتی بـەهۆی منداڵەکەیەوە.

*شـێتی ژن فەرپوپیتـداری سـاڵە ، نەخۆشـکەوتنی سـەر لەلێکدانـەوەدا دەدرێتە پاڵ سەرۆك.

(نابلـسی)دەڵێـت: شـێتی لەخـەودا دەوڵەمەندییـە ئەگـەر بـەبێ هۆبـوو، هـەروەها بەڵگەیـە لەسـەر رووتێکردنـی دنیاو داهاتنی شادی‌و خۆشـی بەوانـەی هەواداری دۆستایەتی‌و خزمایەتین.

*ئەگـەر بـەهۆی شـتێکەوە شـێتبوو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سووخواردن.

*وتراوە: شێتی بەڵگەیە لەسەر:

+چوونە نێو بەهەشتەوە.

+عەشق‌و شەیدابوون.

+لێدانی بەسوێ‌و ژان.

+کاروکردەوەی چاکە.

**شێر**: دەسـتەڵاتدارێکی سـتەمکارە بـەهۆی مەترسـی‌و تـووڕەیی‌و جەربەزەییەوە.

نیشانەیە لەسەر:

+جەنگاوەر.

+دزی پەنهان‌و نادیار.

+کرێکاری ناپاك.

+هاوڕێی بەئەرك.

+دوژمنی داواکراو.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسـەر مـەرگ‌و ناڕەحـەتی ، چـونکە ئـەوەی تەماشـی دەکات رەنگی زەرد هەڵدەگەڕێت‌و دڵی

---

[١](ئیبن ماجە) لە(الجنائز) (١٥٨١ ـ ١٥٨٢) و (تـرمذي) (١٠٠١) لـەفـەرموودەیەکـی (ئەبوهورەیرە)ەوە.

بەخێرایی لێدەداتو لەهۆش خۆی دەچێت.

*بەڵگەیە لەسەر دەستەڵاتداری نادیارو ستەمکاری دژ بەمرۆڤ.

*نیشانەو بەڵگەیە لەسەر دوژمنی زاڵو خۆسەپێن.

*ئەوەی شێرێك ببینێ دێتە ماڵەکەی ئەگەر نەخۆشیان هەبێت دەمرێت، وەگەرنا زوڵمو زۆری دەستەڵاتدار روویان تێدەکات.

*ئەگەر شێرەکە پەلاماریداو دەربازبوو یان سەری لێکرایەوە سەری دەپەڕێت.

*بەڵام هاتنی شێر بۆ شارو ئاوەدانی بەڵگەیە لەسەر:

+بڵاوبوونەوەی تاعون.

+ترسو بیم.

+دەستەڵاتداری زۆردار.

+دوژمنی ستەمکار.

*ئەگەر شێرەکە هاتە نێو مزگەوتو سەرکەوت بەسەر منارەکەدا دەستەڵاتدار فەرمانڕەوایەو زاڵدەبێت بەسەر خەڵکیداو ترسو بیم دەخاتە نێودڵیانەوە.

*ئەوەی سواری پشتێك ببێت کاروبارێکی مەزنو گەورە دەگرێتە دەست لەوەی بەپێچەوانەی دەستەڵاتدارەوە دەجووڵێتەوە ، یان بەنێو دەریادا دەڕواتو رووداوێك دێتەپێش لەکاتی خۆیدا ، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر دەرەنجامی بەپێی زیادوکەمی خەوەکەیو بەڵگەکانی کەلەخۆی گرتووە.

*ئەوەی بەربەرەکانی لەگەڵ شێرێکدا بکات بەربەرەکانیە لەگەڵ دوژمن یان دەستەڵاتدار یاخود ئەوەی هێمای شێری دەدرێتە پاڵ.

*ئەوەی سواری پشتی شێر ببێتو شێرەکەش ملکەچو رام بێت زاڵو سەرکەوتوو دەبێت بەسەر فەرمانڕەوایەکی ستەمکاردا.

*ئەوەی پێشوازی لەشێرێك بکات یان بەدیبکات لەلای خۆیو تێکەڵی نەبێت ترسو بیم رووی تێدەکات لەفەرمانڕەوا بەڵام هیچ زیانێکی پێناگەیەنێت.

*ئەوەی هەڵبێت لەشێرو شێرەکەش دوای نەکەوێت قوتارو رزگار دەبێت لەحاڵو بارێك خۆی لێدەپارێزێت.

*ئەوەی گۆشتی شێرێك بخوات ماڵو سامانی بەدەستدەکەوێت لەلایەن فەرمانڕەواوەو زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکەیدا.

*ئەگەر گۆشتی دەڵەشێرێك بخوات دەستەڵاتو فەرمانڕەواییەكی گەورە بەدەستدەهێنێت.
*پێستی شێر ماڵی دوژمنەكەیەتی.
*پەڕاندنی سەری شێر بەدەستهێنانی دەستەڵاتو موڵكە.
*ئەوەی شێر بەخێو بكات هاوڕێیەتی پادشاو فەرمانڕەوای گەورەدەكات.
*ئەوەی شێر بەربەرەكانیو زۆرانبازی لەگەڵ بكات تای لێدێت چونكە شێر گەرمو چوستو چالاكە.
*ئەوەی شێر پێچەوانەی بێت بەلام ئەم بەئاراستەی ئەوبێت دڵنیادەبێت لەشەڕی دوژمنیو داكۆكی نێوانیان هەڵدەگیرێو هاوڕێیەتی دەكەوێتە نێوانیان.
*ئەوەی سواری پشتی شێر ببێتو ترسی لێبنیشێت بەلاو نەهامەتی رووی تێدەكات.
*توولە شێر منالی نێرینەیە.
*هەروەها وتراوە : هەركەسێك لەخەودا ببینێ شێرێكی كوشتوە لەخەمو خەفەت قوتار دەبێت.
*ئەوەی ببێت بەشێر بەپێی حاڵو باری خۆیدەبێت بەستەمكارو زۆردار.
*هەروەها وتراوە: دەڵە شێر كچی پادشاو فەرمانڕەوایە.
*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (محمد)ی كوڕی (سیرین)و دەڵێت: لەخەوا بینیم وەك ئەوەی توولە شێرێك بەدەستمەوە بێتو لەئامێزی بگرم.
كاتێ (ئیبن سیرین) حاڵی پەشێوی كابرا بەدیدەكاتو بەشایستەی ئەوەی نابینێ پێیدەڵێت: چیت داوە بەسەر وەچەی فەرمانڕەواوە ، ئنجا پێی دەڵێت: دەگونجێت ژنەكەت شیر بدات بەیەكێك لەمناڵەكانی فەرمانڕەوا، پیاوەكە دەڵێ: سوێندبێت بەخوا راستدەكەیت.
*هەروەها پیاوێكیتر دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێ: لەخەودا بینیم توولە شێرێكم هەلگرتبوو دەمبردەوە بۆ ماڵەوە ، ئەویش پێی دەڵێت: ملكەچی هەندێك لەفەرمانڕەوایان دەبیت.
*هەروەها لەرۆژانی یاخیبوونی (یەزید)ی كوڕی (موهەلەب) لە(یەزید)ی كوڕی (عەبدولمەلیك) دا خۆی بینی لەخەودا لەسەر شێرێكە لەدەستەبەرەیەكدا، ئەوجا خەوەكەی گێڕایەوە بۆ پیرەژنێك ، ئەویش وتی: روو لەكارێكی مەزن دەكەیتو پاشان تەوقدەدرێت.
*دەڵەشێر ژنێكی خراپی زۆردارە كەجگەر سۆزە بۆ كوڕەكەی، بینینی

شێر نیشانەو بەڵگەیە لەسەر نەزانین‌و خۆبەزلزانین‌و بەخۆسەرسام بوون‌و زۆرداری‌و نازو نووز.

*ئەوەی شێرێك ببینێ بەڵام شێرەکە ئەو نەبینێ‌و هەڵبێت لێی قوتار دەبێت لەوەی ترسی لێنیشتوەو دانایی‌و زانست بەدەستدەهێنێت.

*ئەوەی شێرێك زۆرانبازی لەگەڵبکات بەڵام نەیکوژێ هەمیشه تا دایدەگرێت چونکە شێر هەردەم جەستەی گەرمە یان زیندانی دەکرێت.

*ئەوەی زۆرانبازی بکات لەگەڵ شێرێکدا نەخۆشدەکەوێت چونکە نەخۆشی گۆشت دەتوێنێتەوەو خراپیدەکات ، ئەوەی زۆرانبازی لەگەڵ شێردا بکات گۆشتی لاشەی خراپدەبێت.

*ئەوەی لەگەڵ شێرێکدا جووت ببێ‌و لێی نەترسێ لەنەخۆشی دڵنیا دەبێت.

*ئەوەی لەشێر بترسێ بەڵام دیاری‌و دەستنیشانی نەکات دڵنیا دەبێت لەدوژمنەکەی .

*ئەوەی شێرێك بینێ لەماڵەکەی خۆیدا دەستەڵات‌و ژینێکی دووڕودرێژی پێدەبەخشرێ.

*ئەوەی شێر حاڵ‌و بارێك بهێنێ بەسەریا بەئەندازەی خەوەکەی لەدوژمن‌و ناحەزی‌و بارێکی هاوچەشن رووی تێدەکات.

*ئەوەی ببینێ لەگەڵ شێرێك دەجەنگێ کوشتار دەکات لەگەڵ دوژمنێکی زاڵ‌و بەدەستەڵاتدا.

*ئەوەی دەڵەشێرێك مارە ببڕێ لەبەلاو نەهامەتی زۆر قوتار دەبێت‌و، زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکەیداو پلەوپایەی بەرز دەبێتەوەو ناوبانگ دەردەکات لەنێو خەڵکیدا.

*ئەوەی ببینێ سەری شێر دەخوات دەستەلات‌و موڵکێکی گەورە بەدەستدەهێنێت.

*ئەوەی ببینێ هەندێك لەئەندامەکانی جەستەی شێر دەخوات ماڵ‌و دارایی‌و دوژمنێکی زاڵ بەدەستدێنێت بەئەندازەی ئەو ئەندامەی لەخەودا خواردوویەتی.

*شێر نیشانەو هێمای جەنگاوەرە.

*دزی خۆ مەلاسدارە.

*کرێکاری ستەمکارو هاوڕێی بەئەرك‌و مەرجە.

*(دمیری) دەڵێت: هەرکەسێك ببینێ شێر مەرایی بۆ دەکات لەسەر دەستیدا ڕووداوی سەیر ڕوودەدات‌و دەگونجێت بەڵگەو نیشانەی تیابردنی دوژمنەکەی بێت.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نەزانین‌و خۆبەزلزانین‌و وێڵی‌و سەرگەردانی‌و دەلاڵی.

**شێری هەڵمەتبەر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی ئاژاوەچییەو جەللادی دەستەلاتدارە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی دڕندەیەو خاوەنی وڕێنەیە.

*بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانجی بەردەوامو دیاریو رزقو رۆزی حەلاڵە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دزی لەکاتی بەرەبەیاندا.

**شێلم:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: شێلمو سەرجەم ئەوشتانەی ئاژەڵ دەیخوات زقێکی گەورەیە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ژنێکی گوندنشین، ئەگەر روابوو منداڵی نێرینەی ئەو ژنەو دەمرێ.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ژنێکی گوندنشینە پێست رەقو زبرەو رەوشتی خۆهەڵقورتێنەری هەیە.

*هەروەها دەڵێن: غەمو پەژارەیە ئەگەر وابوو منداڵەو دیسان وەچە دەخەنەوە.

# عەین



**ع ا**

**عائشه( رەزای خوای لێبێت ):** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خێرو فەڕ، ئەگەر ژنێك بینی پلەوپایەیەکی بەرز بەدەستدەهێنێ ناوبانگدەردەکاتو لای باوانو مێردەکەی بەختی دەبێت.

**عاشوراو:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا کەسێکی خانەوادەی پێغەمبەری (ﷺ) بینی لەرۆژی (عاشورا)دان بەڵاو نەهامەتییە بۆی، ئەوەی دوژمنانیان بەدیبکات پێچەوانەی ئەوەیە.

**ع و**

**عود**[1]**:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ژەنینی عود قسەو وتەی درۆیە ، هەروەها گوێبیستبوونی بەهەمان شێوەیە.

*ئەگەر بینی لەماڵی خۆی (عود)دەژنێ بەڵاو نەهامەتیەك رووی تێدەکات.

*هەروەها وتراوە: لێدانی (عود) سەرۆکاری لێدەروژەنەرانیەتی، هەروەها دەڵێن: غەمو پەژارەیە.

*ئەگەر بینی (عود) دەژەنی لەناکاو بچڕا تاڵەکەی لەغەمو پەژارەی قوتاردەبێت.

*هەروەها دەڵێن: هەڵکوڵینی بەڵگەیە لەسەر فەرمانڕەوایەکی رێزدار نیگەرانکراوە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوە لەنەخۆشیو، ئەوەی مرۆڤ لەسەری راهاتوە لەخێرو شەڕ.

*دەگونجێت شارەزای زانیاری جەستەیێ یان زانیاری ئەستێرەکان، بۆ کەسی رەبەن هاوسەرەو بۆ ژنێکی هاوسەرداریش کۆرپەلەیەکی نێرینەیە.

**عوزەیر( سەلامی خوای لێبێت ):** (نابلسی) دەڵێت: بینینی بەدەستهێنانی پلەوپایەیە بەزانیاریو دانایی.

---

[1] **عود:** ئامرازی مۆسیقییە. (وەرگێڕ)

**عوسمانی کوڕی عەففان(ڕەزای خوای لێبێت):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر حەزرەتی (عوسمان)ی بەزیندوێتی بینی حەیاو هەیبەتو، شکۆمەند دەبێتو ئیرییبەرانی زۆر دەبن.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئاهەنگگێڕانی بەزانیاریو پاراستنی خۆشەویستیو خۆبەکەمزانین لەبەر پەروەردگارو دڵنیاییو سەرۆکایەتی.

* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر هێرشی دوژمنانو بەدەستهێنانی گەواهیدان.

* دەگونجێت بەختو رزقو رۆزیو نزیکی لەگەورە پیاوانەوە بەدەستبهێنێ بەهۆی خزمایەتیەوە چونکە بەدوو نورە ناوبراوەو دووکیژی حەزرەت (ﷺ) دوابەدوای یەك هاوسەرییبوون.

* ئەگەر (عوسمان) ی بەزیندوێتی بینی ئاینداری تێکۆشەرەو قورئان لەبەردەکاتو نەیارەکانی لێیدەترسن.

* ئەگەر بینی دەگونجێت چاکەکاربێتو بەستەم شەهیدبکرێ.

* هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر سووربوون لەسەر زانیاریو قورئانو زۆر خوێندنەوەی.

* ئەگەر لەشاری (مەدینە)بینی سینەپاکی پێدەدرێ.

* ئەگەر بینی لەنێو سوپایەکدایەو جلوبەرگی جەنگی لەبەرکردوە فیتنە خۆشدەکات لەنێوان زانایانی فیقهدا.

* ئەگەر بینی مامەڵەدەکاتو دەفرۆشێ خەوبینەر لەدنیادارانەو بەزانیاری خۆی دەڕازێنێتەوەو خۆی وادەردەخات بەڵام وانییە.

* ئەگەر (عوسمان)ی بەکوژراوی بینی لەماڵی خۆیدا جنێوو قسەی ناشیرین بەخانەوادەی پێغەمبەر (ﷺ) دەداتو هەوڵی وابەستەیان نابێت.

* ئەگەر لەشاری (مەدینە)دا بینی یان لەبازاڕا لەگەڵ شەهیدانو پیاوچاکان حەشردەکرێتو زانیاری بەدەستدەهێنێ.

* ئەگەر بینی لەلانەی ستەمدا گەمارۆدراوە ستەم لەزانایەکی گەورە دەکات.

* ئەگەر بینی چوەتەسەر شێوەی ئەو یان جلوبەرگی ئەوی پۆشیوە ئەگەر دەستەلاتداربوو ژێردەستەکانی دەیکوژن یان پلانی لەدژ دەگێڕنو سەرپێچی پەروەردگار دەکات بەهۆیەوە.

* ئەگەر بینی هاوەڵو شەریکەکانی لەگەڵیا نیشتەجێبوونو لەکاتی بێداریدا لەشساغبوو باخۆی ئامادەبکات بۆ بەلایەك یان سزایەك بەسزاو شکاندن پێیدەگاتو عەقڵو هۆشی دەوەستێ،

پاشان دەرەنجامی بەبەلایەکی باش کۆتاییدێت.

**عومەری کوڕی خەتتاب** ( ڕەزای خوای لێبێت ): (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەرکەسێك (عومەر) ببینێ لەئایندا بەدادپەروەری لەوتەو باشی مامەڵەی لەگەڵ ژێردەستەکانیدا ڕێزدار دەکرێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی تەمەندرێژو ڕەوشتبەرز حەقبێژ دەبێت، دەگونجێت (عەمرە)ی ماڵی خوای لەچارە نووسرابێ.

*ئەگەر (عومەر)ی بینیو تەوقەی لەگەڵکرد دنیایەکی بەرینو فراوانو خواناسیو چاکسازیو فیراسەتی پێدەبەخشرێ.

*ئەگەر (عومەر)ی بەرووییەکی گرژەوەبینیو تووڕەبوو لێی فەرمان بەچاکەدەکاتو ڕێگری لەخراپە.

*ئەگەر لەشارێکدا بینی قاتیو قڕی بڵاوبوبوەوە بارانی باشدەبارێو فەروبەرەکەت دەکەوێتەوە، ئەگەر خراپەی تیابوو دادپەروەری تێدا بڵاودەبێتەوە.

*ئەگەر (عومەر)ی بینی لێیدا یان هەڕەشەی لێکرد بادەست هەڵبگرێ لەوەی ئەنجامیدەدات، دەگونجێت دەستەڵاتدار یان زانایەك ڕووی تێبکات.

*ئەگەر بینی چووەتە سەر شێوەی ئەو حاڵو دارایی بەچەشنی گونجاو دەبێتو دەگونجێت بەشەهیدی بمرێت.

*ئەگەر بەرووییەکی گەشەوە بەدیکرد خاوەن سوننەتە.

*ئەگەر لەنێو سوپایەکدابوو چەکی هەڵگرتبوو خواناسیو ترسو بیم لەپەروەردگار بەدەستدەهێنێو خاوەن ئەمانەتدەبێ.

*ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بینی خێرێکی مەزنی دەستگیر دەبێت.

*بینینی (عومەر) بەڵگەیە لەسەر بوونی حەق کەلەسەردەمی ئەودا هەبوە ، لەگەڵ فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەو بانگدان.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ئاشتی دوای دوژمنایەتیو خۆشەویستی لەدوای ڕقو قینو بەختو خزمایەتی لەگەڵ دنیانەویستی.

*ئەگەر بینی بوە بەپادشاو فەرمانڕەواو وڵاتان ئازاددەکاتو ئاین جێبەجێدەکاتو ناڕەحەتییەکانی ئاساندەکاتو سۆزو بەزەیی بۆ ژێردەستەکانی دەبێت.

**ع ە**

**عەبا**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: عەبای لۆکە ئەگەر ئاوریشمی تێدا نەبێت خێری دنیاو قیامەتە.

*باشترین عەباش عەبای هەورانییە، عەبای ئاوریشم ماڵێکی حەرامە لەگەڵ تێکچوونی ئایندا.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەبەریکرد بەڵگەیە لەسەر خێری دنیاو قیامەت، باشترین جلو بەرگیش عەبای هەورانییە لەلێکدانەوەدا بەهێزترە لەعەبای خوری.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: عەبای نوێی سپی شکۆمەندیو مەزنیو ئایینو ئەمانەتە ، عەبای ناسکیش ناسکیی ئایینە.
*هەروەها دەڵێن: عەبا ژنێکی ئاینداره.
*کاروبارێکی مەزنو بالآیە، بۆیەو رەنگی عەبا رەشو رووتییە بەهۆی هەژارییەوە.
*عەبا ئەمانەتە، چونکە شوێنی هەردوولای گەردنە ، گەردنیش شوێنی ئەمانەتە.
*لە(ئیبن سیرین)دەپرسن سەبارەت بەپیاوێك ببینێ عەبایەکی تازەی داوە بەشانیداو دامێنەکەی دڕاوە ، ئەویش دەڵێت: ئەو پیاوە چەند ئایەتێکی قورئان فێربوە ، پاشان لەبیریکردوە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەزستاندا دایبەسەرشانیدا خۆیجوانکردوەو لەخۆی بایبوە ، ئەگەر بینی عەباکەی ونکردوە ئەوە دڵنیا دەبێت لەهەژاریو خۆیدەردەخات لەبەرچاوی خەڵکیدا.
*ئەگەر ژنێك عەبایەکی ونکردوە دڵنیادەبێت لەهەژاریو خۆیدەردەخات لەبەرچاوی خەڵکیدا.
*ئەگەر ژنێك عەبایەك ببینێ هاوسەرێتیو چاکەی لەگەڵدا ناکات.
*عەبا ئەمانەتی پیاوە، چونکە شوێنی گەردنە، گەردنیش شوێنی ئەمانەتە.

**عەبافرۆش:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رێگرتنو پووچەڵکردنەوەی کار یان پەکخستنی سەفەرو سووربوون یاخود وێنەگرتن لەکاری خراپدا.

**عەتارد**[1] : (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا یان تێکەڵبوونی بەڵگەیە لەسەر قەڵەمی بەرینو فراوانو ئەو فەرمانەی دەگاتە لای وەزیران.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گواستنەوەی لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو کوشتار، ئەگەر مانگ لەگەڵ (عەتارد)دابوو لەکاتی بێداریدا بەدبەخت دەبێت ئەوەی بەزۆری لەخەودا دەیبینێ درۆو هەژاریو

---

[1] **عەتارد:** یەکێکە لە نۆ هەسارە گەڕۆکەکە.
(فەرهەنگی دەریا: بەرگی/١ : ٧٢٨٧ ) .

هەوالّی ترسێنەو خراپە رووی تێدەکات. هەروەها عەتارد پیاوێکی پۆلیسە.

عەجور[1]: (نابلسی) دەلّێت: جۆرە خەیارێکە لەخەودا کورە لەدایكو باوکدەچێت.

عەجوە[2]: (نابلسی) دەلّێت: لەخەودا ماڵو سامانێکی کۆکراوی نادیاری حەلالّو باشە ، ئەو خورمایەش چارەسەرە بۆ هەموو نەخۆشەك بەتایبەت عەجوەی شاری (مەدینە).

عەجەم: (نابلسی) دەلّێت: بینینیان لەخەودا بەلّگەیە لەسەر کاروباری قورسوگران بەپێی ئایەتی: ﴿ وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآناً أَعْجَمِيّاً لَقَالُوا لَوْلا فُصِّلَتْ آيَاتُهُ ﴾ (فصلت: ٤٤) ئەگەر بینی بوە بەعەجەمی ملکەچیو رسوایی توشدەبێ.

عەرشی خوداوەندی مەزن: (نابلسی) دەلّێت: ئەگەر بەشێوەیەکی باش بینی مژدەیە بەپارێزگاری بیرو بۆچوونی.

*ئەگەر بینی کەموکورییەکی تێدایە بەلّگەیە لەسەر ئەوەی کردارێك ئەنجامدەدات بیدعەو سەرگەردانییە.

*دەگونجێت عەرش بەلّگەبێت لەسەر ئەوەی مرۆڤ دەیگرێتەبەر لەخێرو شەڕ.

*هەروەها بەلّگەیە لەسەر:

+پلەوپایەیەکی باش بۆ خاوەنەکانی.

+هاوسەرو مالّو ئوتومبیلو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا.

+نەخۆشی لەرزینی لەشولار.

+کرداری چاکە بۆ یەکێك لەسەر کاروکرداری چاکەبێت.

*ئەگەر عەرشی پەروەردگاری بینیو خوداوەند لەسەریبوو بەلّگەیە لەسەر باشیو دلّنیاییو ئاینی.

*ئەگەر بینی ناتەواویەکی تێدابوو بەلّگەیە لەسەر ئارەزوو بیدعە.

عەرەب: (نابلسی) دەلّێت: بینیان بەلّگەیە لەسەر ئاسانکردنی کاروباری قورسوگرانو خوداوەند دەفەرموێت: ﴿ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ ﴾ (النحل:١٠٣).

عەرەفە: (ئیبن سیرین) دەلّێت: ئەگەر بینی لەرۆژی (عەرەفە)دایە ئەرکی خزمایەتی بەجێدەهێنێو ئاشتدەبێتەوە لەگەلّ یەکێکدا کەناکۆك بووبێت لەگەلّی.

(نابلسی) دەلّێت: (عەرەفە) بەلّگەیە لەسەر (حەج)و، دەگونجێت بەلّگەبێت لەسەر:

+رۆژی هەینی.

+بازرگانی بەسوودو بازاڕ.

---

[1] عەجور: جۆرە خەیارێکە.(وەرگێڕ)

[2] عەجوە: جۆرە خورمایەکە.

(فەرهەنگی دەریا: بەرگی١/ لا: ٦٩٦)

*ئەگەر لە(عەرەفە) هەستا لەخەودا پلەوپایەکەی بەئەندازەی خۆی دادەبەزێ بۆ نزمتریان لەشەڕەوە بۆ خێر، دەگونجێت بالآتربێت لەوەی خۆشەویستە لای لەژن یان هەژارێکی داماو، دەگونجێت زاڵبێت بەسەر دوژمندا.

*ئەگەر سەرپێچیکاربوو تەوبەی لێقبوڵدەکرێ، ئەگەر نهێنیەکی شاراوەی هەبوو دەردەکەوێ.

*دەگونجێت وەستان لە(عەرەفە) بەڵگەبێت لەسەر کۆبوونەوە لەگەڵ خۆشەویستێکدا کەوا لێی جیابووبنەوە، ئەگەر لەشەودا وەستا دەڵێن: پێداویستیو داوای خۆی بەدەستدەهێنێ، ئەگەر دوای بەیانی بوو ویستوخوازی خۆی بەدەستناهێنێت.

**عەقیقە**[1] :(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا مژدەیە بەگەڕانەوەی کەسێکی دووړو ئاوارە یاخود بەچاکبوونەوەی نەخۆشو ئازادبوونی دیلوبەند.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیادبوونی باوەڕهێنان بەبەجێهێنانی سوننەت.

[1] **عەقیقە** :ئەو مەڕەیە لەرۆژی حەوتەمی منداڵدا سەردەبڕێو دوای تاشینی قژەسەری ساواکە. (فەرهەنگی دەریا بەرگی ١/٧٤٤)

*ئەگەر لەخەودا شتێکی سەربڕی گونجاوو شیاوبوو لەکاتی بێداریدا یاخود رەفتارێکی ئەنجامدا بەڵگەبوو لەسەر باشی رەفتاری دنیاو قیامەتی.

*ئەگەر بەرازێکی بۆ خەڵکی سەربڕی یان مردارەوەبوویەکدا بەخەڵك وێڕای بوونی زانیاری بەحەرامی ئەوکارە بەڵگەیە لەسەر ئازاردانی دایكو باوك یاخود ئازاردانی یەکێکیان.

**عەلی کوڕی ئەبوتالیب( ڕەزای خوای لێبێت** ):(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر پێشەوا (عەلی) بەزیندوویەتی بینی زانیاری پێدەبەخشرێو ئازایەتیو خواناسی پێدەدرێ.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا، ئەگەر لەشوێنێکدا بینراو خەڵکی کڕنووشیان بۆدەبردو ستایشیاندەکرد یان لەسەر شان هەڵیاندەگرت بەڵگەیە لەسەر کۆبوونەوەیان لەسەر ئاشوبو فیتنە.

*ئەگەر زانایەك بینی زانیاریو خواناسیو شکۆو هێز بەدیار چاوی سەیرکارانەوە وەردەگرێو ترسی گواستنەوەی هەیە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر.

*زوربەی راڤەکاران ئاماژدە بەوەدەکەن هەرکەسێك یەکێك لەوچوار پێشەوایە ببینێ بەشەهیدی دەمرێت.

*ئەگەر خەوبینەر فەرمانڕەوابوو قەلایەك ئازاددەكاتو بەباشە باسدەكرێ.
*دەگونجێت بینینی حەزرەتی(عەلی) (رەزای خوای لێبێت) بەلگەبێت لەسەر مندالو وەچەو رەچەلەكی پیرۆز.
*هەروەها بینینی بەلگەیە لەسەر هەلكەندنی ناموسولمان بەتایبەت جوولەكە.
*دەگونجێت بینینی بەلگەبێت لەسەر پۆستی بەرزو سەفەری قورس وگرانو دەستكەوتی موسولمانانو دەرخستنی كەراماتو ئەوەی بەزیندوویەتی ببینێ ئیرەیی پێدەبرێتو خوداوەند فەرمانڕەواییو هێزی بریارو خواناسو شوێنكەوتنی سوننەتی پێدەدات.
*ئەگەر (عەلی) (رەزای خوای لێبێت) بەپیرییەوە بەچەكەوە بینی خاوەنی ئەو خەونە پەیوەندیكردوە بەفەرمانڕەواوەو سوودو پلەوپایەبەرزی لێوەر دەگرێ.
*ئەگەر بەپیریو بەپشتی چەماوەوە بینی هێزو دەستەلاتی پتەودەبێ.
*ئەگەر بینی سەرووریشی سپیبووەو زانابوو كاروبارو زانیارییەكەی لاوازدەبێت.
*ئەگەر لەجلوبەرگی سەربازو خۆئامادەكردن بۆ جەنگكدا بینی لەشارێك لەشارەكانی موسولمانانداا فیتنەو ئاشوب دەكەوێتەوە نێو دانیشتوانەكەی بەزوبان یان هەر شێوەیەكیتر.
*ئەگەر لەشوێنێكدا بینرا پرپوو لەگەورە پیاوان هەموو تیادەچن.
*ئەگەر بینیو دەستی خەناوییبوو كوڕی خەوبینەر سەردەكەوێت بەسەریا.
*ئەگەر (عەلی) (رەزای خوای لێبێت) بینیو لەشو لاری بریندداربوو خەوبینەر بریندداردەكرێو لەژێر دەستەلاتەكەی دەردەچێ.
*ئەگەر بینی شمشێرێكی لەكالانەكەی دەرهێنا فەرمان بەمندالەكانی دەكات دوای دەستەلات بكەون.
*ئەگەر بینی دەجەنگێ كوڕەكانی سەردەخات.
*ئەوەی لەشوێنو جێگەیەك ببینێ فیتنەو ئاشوب دەكەوێتە ئەو شوێنو جێگەیە.

**عەمرەی ( حەج ):** (نابلسی) دەلێت: بەلگەیە لەسەر كۆتایی تەمەنو دوایی هاتنی ژینێكی خۆشنوود.
*دەگونجێت (عەمرە) بەلگەبێت لەسەر زیادبوونی مالو داراییو تەمەن.
*ئەگەر بینی (حەج)یكرد یان عەمرە ئەوە ژینێكی دوورودرێژ بەسەر دەباتو كاروبارەكانی پەسەند دەكرێن.

عەنقا(سیمرغ)[1] :(ئیبن سیرین) دەڵێت: سەرکردەیەکی بیدعەکارە قسەو وتەکانیشی بەدەستهێنانی ماڵو سامانە لەلایەن پێشەواوە یان بەدەستهێنانی پلەوپایەیە.

*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر ژنێکی شۆخو شەنگ .

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر سیمرغ شتێکی فڕێدا بەسەریا رزقو رۆزی دەدرێ لەلای پەروەردگارەوە بەهۆی سەرکردەو فەرمانڕەوایەکەوە.

*ئەگەر بینی سواری عەنقابوە پلەوپایەی بەرزدەبێتەوەو دەبێت بەکەسێکی بێوێنە، ئەگەر راویکرد پیاوێك فێڵی لێدەکات ، ئەگەر فرۆشتی زوڵمو ستەمی لێدەکات.

*ئەگەر بەبێ فرۆفێڵ راویکرد کورێکی ئازایە .

*ئەگەر جووتبوو لەگەڵی ژنێکی جوانی شۆخو شەنگدەکات بەهاوسەری خۆی.

*عەنقا هەواڵی سەیرو سەفەری دوورە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قسەی پڕوپووچو وڕێنە لەلایەن لەشساغو نەخۆشەوە.

عەورەت:(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەردەستێکی بچووك یان کوری خزمەتکارە.

عەورەتی مرۆڤ:(ئیبن سیرین) دەڵێت: عەورەتی مرۆڤ لەنێو خەڵکیدا رێزو منداڵو کەمو زیادەیە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی درێژبوو لەئەندازەی خۆی زیاتر غەمو پەژارە رووی تێدەکات.

*ئەگەر دوو عەورەتی هەبوو کورێکی دەبێت لەگەڵ یادکردنو رێزیدا، ئەگەر بەدەستی خۆی هەڵیکەند یان هەندێکی لابرد پاشان گەڕاندیەوە بۆ شوێنی خۆی کورێکی دەمرێتو سوودو قازانج دەکاتو هەندێك لەماڵەکەی بەسەردەچێت ئنجا بۆیدەگەڕێتەوە، پچڕانی هەتا لێی دەردەکەوێو بەڵگەیە لەسەر مردنی یاخود مەرگی کورەکەی چونکە یادو باسی دەپچڕێ بەمەرگی.

*پچڕاندنی عەورەتی نەمانی باسو خواسیەتی لەو وڵاتەدا.

*عەورەت ئەگەر کەمیکرد یان زیادیکرد یاخود گەورەبوو یان بچووك دوای ئەوەی یەك رووی هەبوو سەرجەم لیکدانەوەکەی لەبارەی کورو وەچەوەیە.

*ئەگەر بڵاوبوەوە چەند دۆڵو شیوێکی زۆری لێبوەوە سەرجەم لێکدانەوەی

[1] عەنقا( سیمرغ ): باڵندەیەکی ئەفسانەیەو بوێژانی کلاسیکی کوردی زۆر لەقەصیدەکانیاندا باسیانکردوە. (وەرگێڕ)

لەبارەی ڕێزو باسیەتی بەئەندازەی بڵاوبوونەوەی.

*لاوازی عەورەت بەڵگەیەلەسەر نەخۆشی کوڕ یان شکانو دابەزینی پلەوپایەو شکۆمەندی.

*ئەگەر بینی نێرەمووکە ئاینی باشو چاکدەبێ.

*ئەگەر بینی عەورەتی دیارو ئاشکرایە بەڵام تەماشای ناکاتو شەرمیش ناکاتو کەسیش تەماشایناکات لەکاروبارێك ڕزگاریدەبێت کەنەخۆشیو بەلاو غەمو پەژارەو ترسو بیمی لەخۆگرتووە.

*ئەگەر بینی عەورەتی چوەتەوە نێو سکی بەڵگەیە لەسەرئەوەی گەواهیدەدات لەسەری.

*ئەگەر بینی کونی میزی ماچدەکات ئەگەر کوڕی نەبێت کوڕێکی دەبێت، ئەگەر کوڕی هەبێتو سەفەر بکەن دەگەڕێنەوە بۆلایو ماچیاندەکات.

*ژنێك خەوی بینی پێشی کوڕەکەی تووکی کردبوو ئەویش بۆی قرتاندو بڕی خەونەکەی بۆ ڕاڤەکارێکی خەو گێڕایەوە وتی: تەمەنی دوایی هاتوە، ئەوەندەی نەبرد مرد.

*یەکێکیتر بینی پێشی عەورەتی توکێکی زۆریکردوە هەتا ئەملاولای، خەونەکەی بۆ ڕاڤەکارێکی خەو گێڕایەوە ئەویش وتی: بەڵگەیە لەسەر خراپەو ڕۆچوونت تێیدا.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەرماڵو کوڕو تەمەن.

*ئەگەر بینی عەورەتی درێژو گەورەبووەو بەو ئەندازەیەش ناشیرینی نەکرد بەڵگەیە لەسەر ڕۆزی ماڵو سامان.

*ئەگەر بینی عەورەتی لەدەستداوەو غەمو پەژارەی بۆخوارد کوڕەکەی لەدەستدەدات یاخود سەفەردەکاتو باسو خواسی وندەبێ، ئەگەر نەۆخشبێت ئەوە دەمرێت ئەگەر فەرمانڕەوابێت لادەبرێتو لەکاردەخرێ.

*هەڵسانی عەورەت بەڵگەیە لەسەر چوستو چالاکیو بەجێهێنانی پێداویستی.

*ئەگەر بینی سەری دانەواندوە بۆ لای عەورەتیو دەمی لاقەکرد ملکەچی کوڕەکەیدەبێتو دادەبەزێتە سەر خواستی ئەو.

*ئەگەر چەن بەشێکی دی لەعەورەتی بوەتەوە بەڵگەیە لەسەر زۆری وەچەو نەوەی، ئەگەر بوو بەسێ بەشەوە بەڵگەیە لەسەر سێ کوڕ یان مەرگی خۆی.

*ئەگەر عەورەتی بڕا بەڵگەیە لەسەر مردنی یاخود تیاچوونی ماڵو دارایی

یـان مردنـی منداڵـەکانی یـا پـچڕانی وەچەو نەوەی نێرینـە یـاخود ونبـوون و دوورکەوتنــەوەی لــەوڵاتی خــۆی زۆر دەخایەنێت و باسی لەنێودەچێ.

*ئەگـەر یـەکێك لـەو دوو عەورەتـەی بەسـەریەکەوە دی نێربازییـە، ئەگـەر خەوبینەر بەدڕەوشتبێت.

*ئەگەر عـەورەتی یـەکێکی بەدەستی خۆیـــەوە بینـــی مـــاڵ و داراییـــەك بەدەســتدەهێنێت بەئەنـدازەی هـەزار دینار یان هـەزار درهـەم یـاخود بـەپێی ئەوەی شایستەیەتی.

*ئەگەر بینی گاز لەعـەورەتی دەگرێـت ئـەو پیـاوەی خۆشـدەوێ ڕۆدەچـێ لەپیاهەڵدانیدا.

*ئەگەر بینـی عـەورەتی بـڕاوەو کـراوە بەگوێچکەیەوە کچەکەی منداڵی دەبێـت بەبێ مێرد.

*ئەگـــەر بینـــی لەعەورەتیـــەوە کولێرەیەکی گەرم دێتـە دەرەوە هـەژار دەکەوێ.

*ئەگـەر عـەورەتی بینـی لەعـەورەتی ژنەکەیدا دەپچڕێ ژنەکەی دووگیانبێـت ئەو منداڵەی لەباردەچێ ، ئەگـەر بـاخ و باخاتی هەبێت ئـاوی لێدەبڕێ، ئەگـەر هـەردوو گـونی بـڕاو هـەر عـەورەتی مایەوە وەچەی مێینەی نابێت.

*ئەگـەر ژن عـەورەتی پیـاوی هـەبوو ئەگـەر دووگیـانبوو کـوڕێکی دەبێـت، ئەگـەر دووگیـان نـەبوو هـۆزو گـەل و خانەوادەکـــەی بـــەڕێوەدەبات و سەرپەرشـتیاندەکات، ئەگـەر کـوڕی نـەبوو دووگیـانبوو نـەزۆك دەبێـت و هـەرگیز منـداڵی نابێـت، هـەروەها لێکدانەوەی بەم چەشنەیە ئەگەر بینـی ریشیدەرکردوە.

*عـەورەتی پیـاو بـۆ ژن بەڵگەیـە لەسـەرکاری نابـەجێی یـەکگرتنی دوو مێینــە، ئەگـــەر عـــەورەتی نـــەبوو بێهاوسەربوو هاوسـەر دەگـرێ ، ئەگـەر مێرددرابوو تەڵاقدەدرێت.

*ریـش و عـەورەت بـۆ ژن دەگونجێـت هێزبێت بۆ ئەوەی کاروبارەکانی دەبات بەڕێوە.

*هـەروەها دەڵـێن: ئەگـەر ژن ویـستی عەورتی پیـاو ریشی هـەبێت زاڵدەبێت بەســـەر مێردەکەیـــداو دەســـتدان لەعەورەتیش شادی و خۆشییە.

*ئەگەر بینی عەورەتی لەدوایەوەیـەتی تەمەندرێژدەبێت، ئەگەر هاوسـەرەکەی دووگیانبوو لەباریدەچێ.

*ئەگەر هەموو عەورەتی یان هەندێکی لەدەسـتی خۆیـدا بـەدیکرد ، پاشـان گەڕاندیـەوە بـۆ شـوێن و جێگـەی خـۆی کـــوڕێکی دەمـــرێ دوای دەگونجێـــت گەڕاندنـەوەی مـاڵ و سـامان بێـت بـۆی پـاش لەکیسـچوون یـان پـچڕانی نـاوی

بێـتو دیـسان سـەرهەڵدانی بـاس‌و خواسیبێت.

*ئەگـەر خـۆی لەشـوێنێکدا بینـی‌و لەپۆشـاک‌و جل‌وبـەرگ دامـاڵرابوو عـەورەتی رەپ بووبوو شـەرمی نـەکرد لەهەمانکاتیـشدا سـەرقاڵی کـارێکی قـورس‌و گرانبـوو لەدواییـدا دەیدۆزێتەوەو دەگـات بـەهیواو ئـاواتی خۆی‌و زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا.

*ئەگـەر بینـی عـەورەتی هەسـتاوە بـاپیرەی بـەهێز دەکـات‌و دەسـتەڵات‌و فەرمانڕەوایی بۆ دەگێڕێتەوە.

*ئەگـەر درێـژبوەوەو گەیـشتە سەرسـەری‌و لەگـەڵیاجووتبوو بـاس‌و خواسـی لەوڵاتـدا بڵاودەبێتـەوەو باروحـاڵی بەرزدەبێتـەوەو چوسـت‌و چالاکدەبێت.

*ئەگـەر بینـی عـەورەتی گەیشتەسەر سنگی لەباپیرەی بەرزتر دەبێتەوە.

*ئەگەر بینـی لـەژێر جل‌و بەرگەکەیدا شـاردیەوەو هەسـتیپێکرد لەوڵاتـدا باسـدەکری‌و کاروبـارو پلەوپایـەی بەرزدەبێتـەوە دواتـریش وەچـەو منداڵەکانی باسدەکرێن.

*ئەگـەر بینـی گرێیـەکی داوە لەمیزەڵـدانی بـژێوی‌و ژیـانی سـەخت‌و گراندەبێت‌و کاروبارەکانی قورسدەبن‌و گاڵتـە بەکوڕەکەیدەکات، دەگونجێـت هاوسـەرگیری ئەنجامنـەدات بـەهۆی دەستکورتییەوە.

*کـونی عـەورەتیش بەمنـداڵ لێکدەدرێتـەوەو مـەنی لـەوێوە دێتـە دەرەوە چـونکە هـۆی منداڵبوونـە بـۆ ژنێیش هۆی تام‌و چێژە.

*هـەروەها بەڵگەیـە لەسـەر رەوشـت‌و دەسـتەڵات‌و ئـەوەی مـرۆڤ خاوەنیـەتی چونکە هەندێکجار زیادو کەمدەکات.

*ئەگـەر بینـی کـونی عـەورەتی ماچدەکات کوڕەکەی تەندروستی ساغ‌و باشدەبێ، ئەگەر کوڕینەبوو خەونەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی منداڵی نێرینـەی دەبێت ، ئەگەر منداڵی نێرینـەی هـەبوو لـەوڵاتێکی دی دەژیـا دەگەڕێتـەوەو ماچیاندەکات‌و چاوی پێیاندەکەوێ.

*ئەگەر بینـی تـوک‌و مـوو لەعـەورەتی بـاوکی هـاتوە تەمـەنی بـاوکی بەسەردەچێت‌و مەرگی نزیکدەبێتەوە.

*ئەگەر بینی عەورەتی بوە بەعەورەتی ژن هێزو توانای لاوازو کز دەبێت.

*ئەگەر بینی دەستدەدات لەعـەورەتی ژنێـک‌و پاشـان دەبێـت بـەهی پیـاو رەوش‌و هەڵسوکەوتی دەگۆڕێت، ئەگەر وایزانـی عـەورەتی هـەر هـی پیـاوە زوباندرێژو زاڵدەبێت بەسەریا.

*ئەگەر بینی ژنەکەی عەورەتی پیـاوی هەیـەو دووگیـانبوو کـوڕێکی دەبێـت‌و خانەوادەکـەی دەبـات بـەڕێوە، ئەگـەر

کورینەبوو هەرگیز مندالّی نابێت، ئەگەر هەیبووی کورەکە دەمرێت بەرلەوەی بالّغ ببێت، دەگونجێت ئەوەش بگوێزرێتەوە بۆ خاوەنەکەی و لەنێو خەلّکیدا باسبکرێت و پلەوپایە وەربگریّ، ئەگەر لەسەر عەورەتێکیتر روا سوودی نابێت.

*عەورەت بەلّگەیە لەسەرئەوەی خۆی ماندو دەکات بۆ پشوودانی کەسانیتر وەك پێغەمبەرو گیانفیداو شەریك باوك و کورو....

*دەگونجێت بەلّگەبێت لەسەر:

+چاککردنی یان بەخشینی .

+ئەوەی دەیکات بەهاوسەری خۆی.

*ئەگەر لەخەودابینی درێژو رەپ و جوانە بەلّگەیە لەسەر حالّی ئەوەی بەلّگەیە لەسەری، دەگونجێت حالّ و باری باشبێت و مالّ و دارایی زۆربێت یان پاراستنی عەورەت بێت.

*دەگونجێت بەلّگەبێت لەسەر باشی حالّی ئەوەی هەلّدەستێت بەئاودانی زەوییەکەی یان لەشساغی هاوسەرەکەی ، ئەگەر خەوبینەر نەخۆشبوو لەنەخۆشیەکەی چاکدەبێتەوەو غەم و پەژارەی دەرەوێتەوە چونکە هەلّسانی عەورەت لەکاتی مێشك ساف و حالّباشیدایە.

*دەگونجێت زالّببێت بەسەر دوژمنەکانیدا بەهۆی پلەوپایەوە.

*عەورەت بۆ چەکدار بەلّگەیە لەسەر تیرو رم ، بۆ خاوەن کشتوکالّیش بەلّگەیە لەسەر ئامێری کونکەرە ، بۆ ئاسنگەر بەلّگەیە لەسەر فوتێکەرە، بۆ نووسەر قەلّەمەکەیەتی پێیدەنووسیّ، بۆ کەشتیەوان بەلّگەیە لەسەر چارۆکەکەی.

*هەروەها بەلّگەیە لەسەر:

+چەقۆی قەساب.

+چاوێك ئەشك و فرمێسك برژیّ.

+یەك کەلّەچاو.

+ئەو مێروولەو گیاندارانەی شەوان بلاّودەبنەوەو دەگەرێنەوە بۆ کون و شاری خۆیان.

*بوونی عەورەتێکی زیادە بەلّگەیە لەسەر حەلاّلّکردنی ژن بۆ یەکێکیترو دەرخستنی نهێنی و نادیار.

*ئەگەر عەورەتی بینی رەشداگیرساوە یان ناسك و نەرمە یان رووتە بەلّگەیە لەسەر خراپی حالّی ئەوەی بەلّگەیە لەسەری.

*هەروەها عەورەت بەلّگەیە لەسەر ئەوەی دەوەستیّ لەوتەی بێژراو جێبەجێناکات.

*ئەگەر لەپاش و پێشدا زیادوکەمی بەیدکرد دەگەرێتەوە بۆسەرپێشاوی و ئەوەی خۆی پێپاکدەکاتەوە، یان ئەوەی ناگونجێت خۆی پێپاك بکاتەوە وەك پشقل و ئێسقان و خواردن.

*عەورەتی خەتەنەکراو بەڵگەیە لەسەر تیری (مەسیح)، عەورەتی بێخەتەنەش بەڵگەیە لەسەر مەکۆی چنەر.
*ئەگەر بینی یاری بەعەورەتیدەکات ئەگەر لەزانستپەروەران بێت لەبیرکردنو خڵەفان رووی تێدەکات.
*ئەگەر عەورەتی بخوات یان بەشێکی پەیوەندی دەپچڕێ لەگەڵ ئەوەی بەڵگەیە لەسەری.
*ئەگەر عەورەتی لەئاسن یان مسبو یاخود هەر کانزایەك دەوڵەمەند دەبێ، دەگونجێت نەوەو وەچەی ببڕێت یاخود پشوو لەدەستبدات.
*ئەگەر بینی عەورەتی پێستی چووکی پێوەیە زیادەیە لەدنیادا پێیدەگات بەبێ سوننەت.
*ئەگەر برینێك بەعەورەتی خۆیەوە ببینێ گوتەیەکی ناقۆڵای پێدەگوترێو بیریدەخاتەوە.
*ئەگەر بینی یەکێك دەستدەدات لەعەورەتی خۆشیوشادیو شکۆمەندییە.
*ئەگەر بینی خەتەنەکراوە چاکی ئاینە چونکە خەتەنەکردن سوننەتە.

## ع ی

(عیسا) (سەلامی خوای لێبێت) (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر (عیسا)ی بەدیکرد خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پیاوێکی سوودمەندو پیرۆزو فرە خێرو سەفەرکارەو زانستی پزیشکی پێدەدرێ وێرای زانیاری دیکە.
*(حەسەن)ی کوڕی (عەلی) (رەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت: لەخەودا (عیسی)ی کوڕی (مەریەم) بینی وتم: ئەی روحی خودا من دەمەوێت لەسەر ئەموستیلەکەم بنووسم چی بنووسم؟ ئەویش فەرمووی: بنووسە "هیچ خوایەك نییە جگە لە ئەڵلا حەقێکی روونو ئاشکرایەو ئەم نووسینە غەمو پەژارەت لێدووردەخاتەوە".
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر ژنێکی دووگیان (عیسی)ی بینی کوڕێکی دانای دەبێت.
(نابلسی) دەڵێت: ئەوەی (عیسی) ببینێ هیچ خراپەیەك رووی تێناکات لەوساڵەداو ئەگەر داواخوازی شتێکبوو بەدەستیدەهێنێت.
*ئەگەر (عیسی)ی بینی دەبێت بەخواناسێکی گەڕۆك بەسەر زەویداو قوتاردەبێ لەوەی لێیدەترسێ ، ئەگەر یەکێك زۆربینی زانیاری پزیشکی پێدەبەخشرێو لەسەردەمی خۆیدا کەسی وەك ئەوی تێدا نابێ.
*ئەگەر لەشارێك یان ئاپۆرەیەکی خەڵکیدا بینی ئەگەر لەناڕەحەتیدابوون قوتاردەبن چونکە (عیسی) (سەلامی خوای لێبێت) روحو سۆزو بەزەیی خواییە.

*ئەگەر دایکی لەگەڵدابوو بەڵگەیەکی مەزن و گەورەیە لەو شوێنەدا دەردەکەوێ.
*ئەگەر بینی چوەتەسەر شێوەی ئەو یاخود جل وبەرگێکی پۆشیوە شیاوبوو لەگەڵی ئەگەر دەستەڵاتداربوو دەستەڵاتەکەی مەزندەبێ، ئەگەر پزیشکبوو ناوبانگدەردەکات و زۆر سەرکەوتوو دەبێت.
*ئەگەر بەدیکردو لەناخا دەترسا دڵنیادەبێ.
*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندیی و بەرەکەت لەهەرلایەک لابدات.
*ئەگەر نەخۆشێك بینی چاکدەبێتەوە.
*ئەگەر خۆی بینی و نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر مردنی.
*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی ئەوشتانەی خەڵکی پێی سەرسام دەبن و ڕووداوی دادپەروەریی و خۆشی.
*بینینی (عیسی) (سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەیە لەسەر جیاوازی گومان لەئاییندا چونکە جوولەکە وتیان کوشتومانەو هەڵمانواسوەو خوداش دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ﴾ (النساء: ١٥٧) ﴿وَقَالَتِ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللهِ﴾ (التوبة:٣٠) ودەفەرموێت: ﴿وَمَا اتَّخَذَ اللهُ مِنْ وَلَدٍ﴾ (المؤمنون: ١٩).
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر دەرکەوتنی خەڵکی لەنەتەوەی خۆی.
*ئەگەر خەوبینەر پیشەوەربوو یان چارەسەرکاربوو سوود وەردەگرن و کاروبارەکانی ئاسان دەبێت و لەبازرگانی و پیشەی سوودو قازانجدەکات.
*دەگونجێت خەوبینەر تومەتباربکرێ و لەکاتێکدا پاکبێت یان درۆ بەدەمی خۆی و دایکیەوە بکات.
*بینینی لەگەڵ دایکی بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی نیشانەیەك لەشاردا.
*دەگونجێت بینیان (عیسی و خاتوو مەریەمی دایکی) بەڵگەبێت لەسەر غەم و پەژارەو گواستنەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر دەرکەوتنی شتی سەرسام و دەگمەن.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر قبوڵبوونی دوعاو تووڕەبوون لەگەورەو سەرداران چونکە ئەوانەی داوای سەرەکەیانکردو باوەڕیان پێنەهێنا کران بەبەراز، هەروەك چۆن دەستدرێژکارانی نەتەوەی (موسی) لەشەممەدا کران بەمەیموون.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بوونی هاوڕێ و قوتابی باش.

* ئەگەر منداڵی بچووك(عیسی)ی بینی بەهەتیوی لەئامێزی دایکیدا گەورەدەبیٚو چاكو باشو زانادەبیٚ.
* هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر دووردڵی لە(میسر)ەوە بۆ (شام)و بەپێچەوانەشەوە.
* ئەگەر خەوبینەر سستو هێواش باسدەکرا لەسەرەتای تەمەندا بەڵگەیە لەسەر چارەنووسی باشی چونکە (عیسی) (سەلامی خوای لێبێت) لەکۆتایی دنیادا لەئاسمانەوە دادەبەزیٚو (دەجال) دەکوژیٚو دادپەوەری لەسەر گۆی زەوی بلاّودەکاتەوە.
* دابەزینی (عیسی) (سەلامی خوای لێبێت) لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی دادپەوەری لەو شوێنەداو دابەزینی فەرو پیرۆزیو تیاچوونی بێباوەڕانو سەرکەوتنی باوەڕداران.

عیشق: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا غەمو پەژارەیە ، ئەگەر بینی بوە بەعاشق تاقیدەکرێتەوە.
* عاشق ئالوودەیەکە بۆ چاکە یان خراپە.
* خۆشەویستی لەدڵدا فیتنەو ئاشوبە بۆ خاوەنەکەی.
* ئەگەر فیتنەیەکی لەدڵیا بینی خۆشەویستیە.
* ئەگەر بینی کارێك ئەنجامدەداتو بەدڵ حەزی لێدەکات کارێك ئەنجامدەدات کۆتایی نییە.
* ئەگەر بینی پیاوێك لەخەودا پێی وت: من تۆم خۆشدەوێت رقی لێیەتی.
* ئەگەر بینی هەموو حەزو ئارەزوویەك بەجێدەهێنیٚو هیچ رێگرێکی نییە هەموو بەلاّو نەهامەتیەك دێت بەسەریاو دڵی تێکدەدات.
* عیشق غەمو پەژارەیە ئەگەر بینی بوە بەعاشق غەمو پەژارەی توشدەبیٚ چونکە عاشقان غەمو پەژارەدارن.
* عیشق بەڵگەیە لەسەر دەرخستنو گوتنی قسەیەك نەیتوانیوە بیشارێتەوە.
* عیشق تاقیکردنەوەیە لەکاتی بێداریداو ناوبانگە سۆزو بەزەیی خەڵکی دەهێنێتو بەڵگەیە لەسەر هەژاریو مەرگ بۆ نەخۆش.
* دەگونجێت مەرگ لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر عیشقو دوورکەوتنەوە لەخۆشەویست.
* سووتانو داخکردن لەخەودا عیشقە.
* عیشق تێکچوونی ئاینو نەبوونی پارەیە.

# غەین



## غ ە

**غەم‌وپەژارە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەی لێخۆشبوونی گوناهو تاوانە بەپێی وتەی پێغەمبەر (ﷺ): "هەر گرفتو ناخۆشییەك روو لەموسوڵمانانت بكات تەنانەت غەم‌و پەژارەش خوداوەند بەو ئەندازەیە گوناهی دەسڕێتەوە"[1].

*غەم‌و پەژارە بەڵگەیە لەسەر عیشق، ئەگەر بینی غەمبارە بەعیشق تاقیدەكرێتەوەو غەم‌و پەژارە دەخوات.

## غ ی

**غیرەت:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا سووربوونە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی غیرەی هەیە سوورە لەسەركارەكانی.

*ئەگەر بینی سوورە لەسەر شتێك‌و داكۆكی لێدەكات سوور دەبێت لەسەرماڵ‌و سامانی دنیا.

[1](مسلم) لە (البر والصلة) (٢٥٧٣) لەفەرمودەیەكی (سەعید)و (ئەبوهورەیر)ەوە هێناویەتی.

# فیٚ



## ف ا

**فاتمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ):** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر لەدەستدانی هاوسەرو باوكو دایكو دڵەڕاوکیٚو نائارامی.

**فالودە**[1]: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا وتەیەکی نەرمو نیانو باشە لەبارەی بژێوییەوەو زۆرەکەشی رزقو رۆزی زۆرو دەستکەوتە.

* ئەگەر بینی (فالودە) دەخوات رزقو رۆزی دەدریٚ لەگەڵداو یان دەستکەوت لەگەڵ خۆشحاڵیو سەروەریو دەگونجێت بەڵگەشبێت لەسەر نەخۆشی ئیفلیجی.

**فالگرتنەوە:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پووچەڵکردنەوەی کاروپیشە.

* ئەگەر بینی هات بۆلای فالگرەوەیەكو پرسیاری لێکرد دەربارەی بابەتێك بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەیەکی توندو سەخت.

**فانۆس(چرا):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بژێوی پەیداکاری.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرەکەی.

* دەگونجێت کوڕێکبێت هێشتا لەدایك نەبوویٚ.

* دەگونجێت فانۆس بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی مرۆڤ بەهۆیەوە رێنومایيو تیشکی رووناکی وەردەگریٚ.

* ئەگەر فانۆسێکی بینی کوژابوەوە ئەوکەسەی بەڵگەیە لەسەری دەمریٚ لەزاناو بژێوی پەیداکارو کوڕ، یاخود چاوی کوێردەبیٚ یاخود ئاینەکەی دەپێکریٚ بەپێی زیادو کەمی لەخەوەکەیدا.

---

[1] **فالودە:** حەڵوایەکە لەئاردو ئاوو هەنگوین دروستدەکرێتو ئێستاش لەنیشاستەو شیروو ئاوو شەکر دروستدەکریٚ.
(فەرهەنگی دەریا : ٨٤٨/١).

* ئەگەر چراو فانۆسێکی لەماڵی خۆیدا بینی تیشكو ڕووناکی بڵاوکردبووەوە ژنەکەی یا کوڕەکەیەتی ناوبانگێکی باشیدەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیەلەسەر بژێوی بۆ ئەوانەی شایستەو ئالودەن، ئەگەر لەوانەبوو کەپێوەی دەگەڕان لەماڵدا بەڵگەیە لەسەر خاوەن ماڵ یان ئەوەی کاروباری ماڵ بەڕێوەدەبات.

* ئەگەر فانۆسەکە لەزێڕبوو خێرێکی چەسپاوو جێگیرە ، ئەگەر لەشووشە بوو کەمترە لەوە، فانۆس وەك ژیانی وەچەی ئادەم وایە لەگەڵ سروشتیدا لەخەوەکەدا. روح وەك چارەیەك وایە ئەگەر بینی نەوتی چراکەی لێڵبوو خوێنەکەی لێڵدەبێ، ئەگەر هەمووی بەپاکیو سازگاری بینی لاشەو خوێنەکەی بەپاکیدەمێنێتەوە.

* فانۆس دەروونی نەوەی (ئادەم)و ژیانیەتی، نەمانی نەوت ڕۆیشتنی ژیانیەتیو پاکێتی پاکی ژینو بژێویەت، لێڵیان لێڵی بژێوییەتی بەچەشنێ لەشولاری چارەسەر وەرناگرێ.

**فانیز**[1] (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دەرووخۆشیو رزقو رۆزییەکی ئاسانە.

**ف ر**

**فرمێسك (ئەشك)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: فرمێسکی سارد خۆشیو شادییە، فرمێسکی گەرمیش غەمو پەژارەیە.

* ئەگەر بینی فرمێسك بەکوڵمو گۆنای خۆیەوە بەبێ ئەوەی بگری نکوولیو رەخنە لەرەچەڵەکی دەگرێت.

* ئەگەر فرمێسکی دی لەچاویدا دەهاتەخوارەوە ماڵێکی حەلاڵ کۆدەکاتەوە لەکاروبارێکی ئاینیو نایەوێت ئاشکرای بکات، ئەگەر بەسەر کولمو گۆنایدا هاتە خوارەوە دڵی نەرمو نیاندەبێتو دەیبەخشێ.

* ئەگەر فرمێسکی چاوی راستی بەدیکرد چوە فرمێسکی چاوی چەپی کچی کچەکەی دەهێنێت ـ پەنا بەخوا.

(نابلسی) دەڵێت: ئەو فرمێسکەی لەکاتی باوێشکدا دێتە دەرەوە غەرامەیەکی کەمە بەبێ هۆ لەخاوەنەکەی دەسێنرێت.

* فرمێسك لەکاتی بینینی ڕووناکیدا یاخود تیشکی خۆر یا ئاگردا بەڵگەیە لەسەر زیان لەرێگەی ئەوەی کەخۆرو ئاگرو ڕووناکی بەڵگەیە لەسەری.

*دەگونجێت فرمێسك بەڵگەبێت لەسەر تەنیاییو ئاوارەییو سۆزو بیری خۆشەویستی دۆستان.

---

[1] **فانیذ**: جۆرە شیرینیەکە. (وەرگێڕ)

**فرۆشتن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت:

فرۆشتن لەلێکدانەوەدا جیاوازە بەپێی فرۆشراو ، ئەوەی ببینیٚ دەفرۆشیٚ یان بانگی بۆ دەکات ئەگەر کریارەکەی پیاوبوو غەمو پەژارە رووی تێدەکات، ئەگەر ژنێك کڕی دەستەلآت یان مەزنیو رێزداری بەدەستدەهێنێت هەرکات نرخی زۆرتر بێت بەرێزتر دەبێت.

*هەروەها واپێویست دەکات رێز لەفرۆشراو بگریٚ بەپێی ئایەتی:﴿وَقَالَ الذِيِّ اشْتَرَاهُ مِنْ مِصْرَ لأمْرَأتِهِ اكْرِمِي مَثْوَاهُ﴾هەرشتێك بۆ فرۆشیار خراپ بێت بۆ کڕیار خێرەو ئەوەشی خێرە بۆ فرۆشیار بۆ کڕیار شەڕە.

*هەروەها دەڵێن: فرۆشتن تیاچوونی موڵكو دەستەلآتە ، فرۆشیار کڕیارەو کڕیاریش فرۆشیارو فرۆشتن زاڵکردنە بەسەر کڕراودا ، ئەگەر ئەوەی فرۆشتی بەلگەبوو لەسەر دنیا قیامەتی پێشخستوە بەسەریا، ئەگەر ئەوەی فرۆشتی بەلگەبوو لەسەر قیامەت دنیای زاڵکردووە، فرۆشتنی مرۆڤ ملکەچیو رسواکردنیەتی یاخود چارەنووسی باشیەتی بەپێی چیرۆکی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت).

*فرۆشیارو کڕیار جیاوازن ، ئەوەی ببینیٚ شتێك دەفرۆشیٚ یان دەیکریٚ پێویستیو ئاتاجی پێیەتی چونکە مرۆڤ لەکاتی پێویستیدا دەفرۆشێت، ئەگەر ناچاربوو بیفرۆشیٚ شتێك دەکریٚ، ناچاریش مرۆڤ دەبات بەرەو فروفێڵ.

*ئەوەی ببینیٚ شتێك دەفرۆشیٚ لەجۆری بەرزو خۆشەویست دەکەوێتە بشێویو دوودڵیو پێکدادانەوە یان مەترسیو ئومێدەوارە سەرکەوتوو قوتار ببێت لەتیاچوون.

*ئەگەر بینی شتێکی ناقۆلآو بێخێر دەفرۆشیٚ ئەگەر شتێکی خۆشەویستی کڕی رێکخستنی قوتاربوونە لەوەی خۆی لێیدەپارێزێت، ئەگەر لەجۆرێکی خراپو ناقۆلآ بێت رێکخستنەکە هەڵەیەو خەموپەژارە رووی تێدەکات.

(نابلسی) دەڵێت: فرۆشتن لەخەودا رزگاربونو لێبوونەوەیە لەوەی فرۆشتوویەتیو بوونی ئارەزوو حەزە لەوەی کڕیوویەتی.

*ئەگەر لەخەودا شتێکی ناقۆلآی فرۆشتو شتێکی گرانبەهاو بەنرخی کڕیو لەجەنگدابوو بەشەهیدی دەمرێت، ئەگەر شتێکی گرانبەهای فرۆشتو شتێکی سووكو نابووتی کڕی

بەڵگەیە لەسەر خراپی دەرەنجامو کۆتایی (پەنا بەخوا).

*ئەوەی دەیەوێت حاڵوباری گۆڕانی بەسەردا بێت بەڵگەی خێروچاکەیە. سەبارەت بەدەوڵەمەندو نەخۆشو کێشەدا بەڵگەیە لەسەر شەڕو خراپە.

**فرۆشگا:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر هەموو شوێنێك سوودی لێوەر بگیرێت لەدنیادا یان لەقیامەتدا وەك بێستانو دارخورماو دارو ژنو باوكو دایكو كتێب.

*ئەگەر فرۆشگاکەی بینی هەرەسیهێنابوو دەمرێت چونکە بژێوی لەوەوەیە، ئەگەر دایکیشی نەخۆش بێت تیادەچێت ، ئەگەر هاوسەرەکەی دووگیان بێتو نەخۆش بێت دەمرێت ، چونکە دنیا مایەی خۆشیو شادییەتی.

*ئەگەر هیچکام لەوانە نەبوو بژێوی قورسو گرانەو شوێنو جێگەی بژێوی پەکیدەکەوێتو دەگمەن دەبێت.

*ئەگەربینی دەرگای فرۆشگاکەی دەشکێنیّ دەگوێزرێتەوە لێی.

*ئەگەر دەرگای فرۆشگاکانی بینی داخرابوون بازاڕساردی رووی تێدەکاتو بازرگانییان دەوەستیّ.

*ئەگەر دەرگای فرۆشگاکەی داخرابوو دەمریّو باسو خواسی نامێنێت.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر دوکانەکەی رووخا ژنەکەی تەلاقدەدات یان لەکوڕەکەی جیادەبێتەوە، یاخود کوڕەکەی دەمرێت ئەگەر نەخۆشبوو، یاخود ماڵو دارایی لەدەستدەداتو دەمرێت یان ئاژەڵەکەی دەبەخشیّو نهێنی سەرهەڵدەدات.

*ئەگەر فرۆشگاکەی بەتازەو جوانو رازاوەو بۆنخۆشی بەدیکرد ئەگەر رەبەنبوو ژنێکی باشدەهێنێت یاخود کوڕێکی دەبێت، ئەگەر نەخۆشبێت چاکدەبێتەوەو تەمەنی درێژ دەبێتو پلەوپایەی بەرزو بڵند دەبێت، یان نهێنی پەنهاندەکات.

*دەگونجێت فرۆشگا بەڵگەبێت لەسەر باوكو دایك چونکە هۆکاری لەدایکبوونیەتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر باوكو دایك چونکە هۆکاری لەدایکبوونیەتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانیاریو بەختو دەنگی، ئەوەی روودەدات لەفرۆشگاکەی لەزیادەو کەمکردن یاخود نوێکارییو رووخاندنو گۆڕینی شوێنو جێگە بەڵگەیە لەسەرئەوەی خاوەنی فرۆشگاکەیە.

*ئەگەربینی لەفرۆشگاکەی دانیشتوە خێرێکی دەستدەکەوێت.

**فرۆشەرو دروستکەری کاغەز:** (نابلسی) دەڵێت: پیاوێکە خەڵکی فێری فرۆێڵدەکات چونکە نووسین فرۆفێڵە.

**فرۆشەری شتی دەگمەن و ناوازە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بازرگانی کۆیلەیە، بینینی بەڵگەیە لەسەر زانینی باشترین گفتارو رۆچوون لەدەریای زانیاریدا.

*بەڵگەیە لەسەر جادوو ئەگەر بینی یاری پێدەکات جادوو دەکات یان هەوڵی جادوو دەدات.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر جادوو دوعاو ویستو خواز ئەگەر لەماڵی خۆیدا روویدا لەوێدا تەختدەکرێ.

**فرۆشیاری رەها:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر بژێوی خراپو نادیاری کەبەهۆی کارەکەیەوە واز لەنوێژ دەهێنێتو لەکێشانەدا دزیدەکاتو سوو دەخواتو پاك نییە.

*بینینی جۆفرۆش بەڵگەیە لەسەر پیاوێك کەدنیای خۆش بوێتو بیر لەقیامەت نەکاتەوە.

*ئەگەر بینی لەسەر فرۆشتنی بتێك درهەمو دینار وەردەگرێ هیچی تیا نییە .

*فرۆشەری خووری بەڵگەیە لەسەر سەفەر.

*قاپی شیرفرۆش بەڵگەیە لەسەر ماڵو پارە.

*فرۆشەری جلوبەرگی گرانبەها ئەمانەتیو مەترسیدارە ئەگەر بەهاکەی وەرنەگرێ.

*فرۆشەری سەوزەو میوە پیاوێکی ئاینی بەسەر دنیادا زاڵکردووەو زۆرماندوە لەهەوڵدان بۆ بژێویو رزقو رۆزی.

*بۆنفرۆش خاوەن پەژارەو گریانە یان پیاوێکی قورئانخوێنەو خەڵکی دەخاتە گریان.

*پەلەوەرفرۆش کۆیلەفرۆشە یان زەوتکاری ئازادی مرۆڤە.

**فرەخەیاڵ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پیاوێکی کەم ئەقڵو ژیرییە خۆی بەکارێك تیادەباتو لەبەرچاوی خەڵکیدەیخات.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی مرۆڤی فرەخەیاڵ بەڵگەیە لەسەر خۆشیرینکردن لای خەڵکیو خۆبردنە پێشەوەو بەڵگەیە:

+شتێك قازانج نەهێنێت.

+سەرسامیو لەبیرکردن.

**فریشتەکان( سەلامی خوایان لێبێت ):**
(ئیبن سیرین)دەڵێت: (جەعفەر)ی کوڕی (خەیات)(رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پیرێکی خواناس وتویەتی: پێغەمبەرم ( ﷺ)لەخەودا بینی دانیشتبوو لەگەڵ کۆمەڵێك هەژاردا بەرگی سۆفیگەرانیان پۆشیبوو، لەناکاو ئاسمان درزیبردو (جوبرەئیل)و فریشتەکانی لێدابەزین بەدەستەوە تەشت و کتریان هەڵگرتبوو، ئاویاندەکرد بەدەستی هەژاراندا و قاچیشیان بۆ دەشت، کاتێ گەیشتە لای من دەستم درێژکرد هەندێکیان لەنێو خۆیاندا وتیان: ئاو مەکەن بەدەستیدا لەوان نییە، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا( ﷺ) گەرچی لەوان نەبم بەلاّم خۆشمدەوێن ، پێغەمبەری خواش( ﷺ) فەرمووی: باوەڕدار لەگەڵ ئەو کەسەدایە کەخۆشی دەوێت ، ئنجا ئاوکرا بەدەستما هەتا تەواوبووم لەشتنی.

(ئەبوسەعد)(رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: بینینی فریشتە لەخەودا ئەگەر ناسرابوون و مژدەیان دەدا بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی شتێك بۆ خەوبینەرو شکۆمەندیو مەزنیو هێزو مژدەو سەرکەوتن دوای ستەمو زۆرداری یاخود چارەسەرە دوای نەخۆشی یان دڵنیاییە لەدوای ترس وبیم ، یان ئاسانییە دوای قورسیو گرانی، یا دەوڵەمەندییە دوای هەژاری یاخود غەزادەکات و شەهید دەکرێ.

*ئەگەر بینی فریشتەیەك مژدەی کوڕێکی دەداتێ کوڕێکی زاناو رێنمایکراو پێشەنگی دەبێ بەپێی ئایەتی: ﴿إِنَّ اللهَ يُبَشِّرُكَ بِكَلِمَةٍ مِنْهُ﴾ (ال عمران : ٤٥) هەروەها ئایەتی: ﴿إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا﴾ (مريم: ١٦).

*ئەگەر چەند فریشتەیەکی بینی کاشی پڕ لەمیوە یان پێبوو بەشەهیدی لەدنیا دەردەچێت، دەگونجێت لەهاوسەرەکەی جیاببێتەوە .

*ئەگەربینی فریشتەکان لەشوێنێکدان و ئەویش لێیان دەترسێ لەوشوێنەدا فیتنەو جەنگو ئاشوب دەکەوێتەوە.

*ئەگەر فریشتەکانی لەشوێنی جەنگدا بینی زاڵدەبێت بەسەر دوژمناندا.

*ئەگەربینی چەماونەتەوە لەبەر پێدا یان کڕنووشیان بۆ بردوە هیواو ئاوات و باس و خواسیدەکرێ.

*ئەگەربینی زۆرانبازی لەگەڵ فریشتەیەکدەکات غەم وپەژارەو ملکەچی دوای شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت .

* ئەگەر نەخۆشێك بینی فریشتەیەك هاتوەتە لای فریشتەیەکیتر مەرگی نزیکە.

* ئەگەر بینی فریشتە لەئاسماندا بەرزیوون بۆسەر زەوی بەڵگەی شکۆمەندییە بۆ حەقپەروەران و، ملکەچی و رسواییە بۆ پووچ پەرستان و سەرکەوتنی تێکۆشەرانە.

* ئەگەر فریشتەکانی لەشێوەی ژناندا بینی درۆدەکات بەدەم پەروەردگارەوە بەپێی ئایەتی: ﴿أَفَأَصْفَاكُمْ رَبُّكُم بِالْبَنِينَ وَاتَّخَذَ مِنَ الْمَلَائِكَةِ إِنَاثًا إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا﴾(الاسراء:٤٠).

* ئەگەربینی لەگەڵ فریشتەکاندا دەفڕێ یان سەردەکەوێت لەگەڵیان روو بەئاسمان و ناگەڕێتەوە رێزو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێ و شەهید دەکرێ.

* ئەگەربینی تەماشای فریشتەکان دەکات بەڵاو نەهامەتی رووی تێدەکات بەپێی ئایەتی:﴿يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلَائِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ﴾ (الفرقان:٢٢).

* ئەگەربینی فریشتەکان نەفرەتی لێدەکەن بەڵگەیە لەسەر سستی و خاوی ئاینەکەی، ئەگەربینی فریشتەکان نیگەرانی دەکەن ماڵ و لانەکەی وێراندەبێ.

* ئەگەر ژمارەیەك فریشتەی بینی لەوڵاتێکدا یان گەڕەك و گوندێك لەو شوێنەدا زانایەك یان خواناسێ دەمرێ یاخود پیاوێك بەناحەق دەکوژرێ ، یان ماڵ و خانوویەك بەسەر کۆمەڵێکدا دەڕووخێ.

* ئەگەربینی فریشتەکان هەمان پیشەی ئەو ئەنجامدەدەن بەرزبوونەوەی پیشەکەیەتی.

* ئەگەربینی فریشتەیەك پێی دەوت: قورئانبخوێنەرەوە، ئەگەر پیاوبوو لەخێرۆمەندانیشبوو رێزو شکۆ بەدەستدەهێنێ ، ئەگەر خێرۆمەند نەبوو باوریابێت، خوداوەند دەفەرموێت: ﴿اقرأ كتابك كفى بنفسك اليوم عليك حسيبا﴾ (الإسراء:١٤).

* ئەگەر فریشتەکانی لەشوێنێکدا بەسواری ئەسپەوە بینی لەو شوێنەدا ستەمکاریێ تیادەچێت.

* بینینیان لەخەو لەجێگەیەکدا بەڵگەیە لەسەر تۆڵەسەندن لەستەمکاران و سەرکەوتنی ستەملێکراوان.

* ئەگەر فریشتەی تۆمارکاری کردارەکانی بینی خۆشی و شادی

لەدنیاو قیامەتدا بەدەستدەهێنێ‌و دوایی کردارەکانی بەباشە کۆتایی دێت ئەگەر لەچاکەکارانبوو، وەگەرنا ترسی هەیە، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿كِرَامًا كَاتِبِينَ، يعلمون ماتفعلون﴾ (الانفطار).

* هەندێك لەزانایان‌و شارەزایانی ئەم بابەتە گوتویانە: بینینی فریشتە لەسەر شێوەی پیرێك بەڵگەیە لەسەر چەرخ‌و سەردەمی رابردوو، بینینیشی لەشێوەی لاوێکدا بەڵگەیە لەسەر چەرخ‌و دەمی ئێستا، لەسەرشێوەی منداڵێك بەڵگەیە لەسەر داهاتوو.

* ئەگەربینی چوەتە شێوەی فریشتە ئەگەر لەناڕەحەتیدابوو دەرووی لێدەکرێتەوە، ئەگەر رێزداربوو پلەوپایە بەدەستدەهێنێ، ئەگەر نەخۆشبوو ئەم خەونە بەڵگەیە لەسەر مردنی.

* ئەگەربینی فریشتەکان سڵاوی لێدەکەن خوداوەند بەرچاوڕوونی پێدەدات لەژیاندا‌و دوایی کردارەکانیشی بەخێر دەبێت.

* دەگێڕنەوە (شمویل)ی جوولەکە بازرگانبوە لەخەودا بینیویەتی کاتێ لەسەفەردابوە فریشتەکان سڵاوی لێدەکەن، لەراقەکارێکی خەو دەپرسێ، ئەویش دەڵێت: تۆ موسوڵماندەبیت بەپێی ئایەتی: ﴿هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ (الأحزاب: ٤٣) پاشان موسوڵمانبوو خوداوەند رێنمووییکرد، هۆکاری موسوڵمانبوونیشی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی قەرزی پیاوێکی موسوڵمانی هەژاری بژاردەوە کاتێ داوایان لێکردبوو.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر هەریەك لەفریشتەکانی بینی لەگەڵی دەدوێن یان شتێکی پێدەدەن شەهیدبوونە خوداوەند پێیدەبەخشێ.

* ئەگەربینی فریشتەکان لەشوێنێك هاتنەخوارەوە ئەگەر خەڵکەکەی لەجەنگدابوون سەردەکەون، ئەگەر بەڵاو نەهامەتی رووی تێکردبوون دەروویان لێدەکرێتەوە.

* دەگونجێت دابەزینی فریشتە بەڵگەبێت لەسەر ناردنی سەرباز لەلایەن فەرمانڕەواوە بۆ ئەو زەوی‌و خاکە یاخود بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی‌و بەڵاو نەهامەتی ئەگەر دابەزینی زۆربوو لەماڵان‌و سەربانەکان.

* دەگونجێت دابەزینی فریشتە بەڕێزەکان بەڵگەبێت لەسەر کرێکارو فەرمانڕەوا.

*ئەگەربینی دابەزین بۆ سەرزەوی‌و قسەیاندەکرد بەخێرو مژدەیاندەدا شایەتی‌و خۆشحاڵی دنیا بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەربینی کڕنووشی بۆ دەبەن یاخود بۆی دەچەمێنەوە پێداویستیەکانی بەجێدێت‌و چاکی پێدەبەخشرێ لەگەڵ ناوبانگی باش.

*ئەگەر لەشێوەی ژناندا بەدیکردن درۆ دەکات بەدەم پەروەردگارەوە.

*ئەگەر فریشتە روحانیەکانی بینی رێزو شکۆمەندی‌و فەڕو بەرەکەت‌و سوودو قازانج‌و ناوبانگی باش بەدەستدەهێنی‌و دەبێت بەپێشەنگ بەڵام لەکۆتایی تەمەنیدا کەم‌و کوڕی‌و نارەحەتی‌و دووزوبانی رووی تێدەکات.

*ئەگەربینی بوە بەفریشتەرێزو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەربینی زۆرانبازی لەگەڵ فریشتەدا دەکات لەشوێنی خۆیدەچێت.

*بینینی فریشتەکانی دۆزەخ بەڵگەیە لەسەر دژایەتی‌و پەرتەوازەبوون.

*ئەگەر منداڵێك فریشتەی بینی بەڵگەیە لەسەر رابردوو، ئەگەر لاوێك بینی بەڵگەیە لەسەر ئێستاو ئەگەر پیرێك بینی بەڵگەیە لەسەر رابردوو.

*ئەگەربینی بوە بەفریشتە دەبێت بەقەشەو رمڵ لێدەرو فێڵباز، ئەگەر نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*ئەگەربینی لەگەڵ فریشتەیەکدا جووتبووە ئەگەر چێژی وەرگرت ماڵ‌و سامان لەرێزداران بەدەستدەهێنێ، ئەگەر تام‌و چێژی وەرنەگرت بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*ئەگەربینی فریشتەکان داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن ئاین‌و حاڵ‌وباری باشدەبێت‌و ماڵ‌و سامانیشی زیاد دەکات.

*ئەگەر فریشتەکان لەگۆڕستان هاتنە خوارەوە لەو شوێنەدا پیاوچاکان ئەسپەردە دەکرێن.

*ئەگەر فریشتەکانی لەبازاڕدابینی بەڵگەی ناتەواوی کێشانەیە.

*ئەگەربینی زۆرانبازی لەگەڵ فریشتەیەکدا دەکات غەم‌و پەژارەو ملکەچی بەسەردادێت دوای شکۆمەندی‌و رێزداری.

*دەگونجێت بینینی فریشتەکان بەڵگەبێت لەسەر شایەتی یان کەسانی ئەمین‌و پۆلیس‌و فەرمانبەران بەچاکە.

*فریشتەکانی سزاو خەشم ئەگەر بینی چوونە لای مردوو بەڵام نەترسا لێیان بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی لەولایەوە

کەدەترسێ، ئەگەر لەسەفەردابوو دڵنیا دەبێت لەجەردەو دز، ئەگەر سڵاویان لێکرد یاخود بەڵگەکانیان پێوت یاخود بەشی خێریان پێدا مژدەیەو هیواو ئومێدی خۆی لەگەڵ دەوڵەمەندیو خۆشـــیو شـــادی دەروونـــی بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بەتوورەیی بەدیکردنو لێیاندا بەئاسـن یـاخود کـەم ئەنـدامیانکرد دەگونجێت لەئاینەکەی پاشگەزبێتەوە یاخود بگەڕێتەوە بۆ سەرپێچیکردنو ئازاری دڵی دایكو باوکی بدات.

*بینینیان بەڵگەیە لەسەر نوێنەرانی پادشا یاخود جێگرانی.

*ئەگەر بەمردوویەك راگەیەندرا ناچنە لای بەڵگەیە لەسەر باشی ناوبانگیو وەرگرتنـــی خواناســـیو باشـــی چارەنووسی.

*ئەگەر قەرزاربوو قوتار دەبێت لێی.

*دەگونجێـت بینینیـان بەڵگـەبێت لەسەر:

+چاکبوونەوەی نەخۆش.

+وەرگێڕو شارەزایان.

*ئەو فریشتەیەی روودەکاتە مردوو لەگۆڕەکەیدا بینینی بۆ هەژار بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندیو، ئەگەر بێکاربوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خزمەتدەکات یاخود شایەتیدانو رەواندنەوەیەتی.

**فریشتەی پارێزکار:** (نابلسی)دەڵێت: ئەوانەی کردارەکانی مرۆڤ تۆمار دەکەنو لەخەودا زانایانی ئەمینو پارێزکارن.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی فریشتەکانی کردارنووس ببینێت مژدەو شادییە لەدنیاو قیامەتداو بەهەشتی دەبێ ئەگەر خواناسبوو، ئەگەر خواناسیش نەبوو بابترسێ لەفەرمایشتی پەروەردگار: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ، كِرَاماً كَاتِبِينَ ،يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾ (الانفطار).

**فریشتەی مردن( روحکێش ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر فریشتەی مردنی بەروویەکی گەشەوە بینی بەشەهیدی دەمرێ ، ئەگەر بەتوورەییەوە بینی بەبێ تەوبە دەمرێ، ئەگەر زۆرانبازی لەگەڵکرد نزیکدەبێتەوە لەلێواری مردنو پاشان خوداوەند قوتاریدەکات.

*هەروەها وتراوە: ئەگەر فریشتەی مـــەرگی بینـــی خوداوەنـــد تەمەندرێژیدەکات.

*(حەمزە)ی (زەیات)دەڵێت: فریشتەی مردنم لەخەودا بینی منیش لێمپرسیو پێمگوت: توخوا پێم بڵێ هیچ خێرێکم

هەیە لای تۆ ؟ وتی: بەڵێ، نیشانەکەی مردنیەتی لە(حەلوان).

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر (عزرائیل)ی ببینی تەمەندرێژ دەبێت چونکە (عزرائیل) تەمەنی لەهەموو دروستکراوان درێژترە.

*ئەگەر (عزرائیل)ی ببینی رووددەکاتە کارێك هەردەبێت رووی تێبکات.

*هەروەها دەڵێن: بینینی ترس و بیمێکی گەورەیە.

*ئەگەر ببینی چوەسەر شێوەی (عزرائیل) زاڵدەبێت بەسەر خەڵکیدا یاخود دەبێت بەپیاوی دەستەلاّتدارو کاروباری مەزن و گەورە لەسەر دەستی ئەودا بەرپا دەبێت.

*ئەگەرببینی ماچی فریشتەی مردن دەکات میراتی بۆ دەمێنێتەوە.

*بینینی (عزرائیل) (سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەیە لەسەر:

+پەرتەوازەبوونی کۆمەڵ.

+مەرگی نەخۆش.

+رووخان.

+ئاگرکەوتنەوە.

+هەواڵی ناخۆش و جەرگبڕ.

*دەگونجێت خەونەکەی بەڵگەبێت لەسەر زەرەروسستی بژێوی و وەستانی بژێوی و دانیشتن و هەوڵنەدان بۆ پەیداکردنی پارە.

*هەروەها بەڵگەیەلەسەر:

+زیندان.

+شکاندنی بەڵێن و پەیمان.

+نەدانی زەکات.

+بەجێهێنانی ماف و حەقی ئەستۆ.

+گۆشەگیری.

+بەرزبوونەوەی نرخ.

+خراپبوونی بەروبووم و کشتوکاڵ.

+نەشونماو گەڕانەوەی لەشولار بۆ حاڵی پێشوو.

*دەگونجێت بینینی (اسرافیل)و (عزرائیل)بەڵگەبێت لەسەر ناچارکردنی دوژمنان و بەدرۆخستنەوەی ئەوانەی زیندوبوونەوە بەدرۆ دادەنێن.

*بینینی (عزرائیل) بۆ خۆشەویستانی پەروەردگار بەڵگەیە لەسەر دەستەبەرکردنی هێمنی و گەیشتن بەهیواو ئاوات و بەدەستهێنانی بەڵێن و پەیمان و دەرچوون لەناڕەحەتی ژیان بۆ فراوانی و خۆشی.



فڕین: (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر شوێنی بژێوی خاوەنەکەی وەك دوکان و فرۆشگاو زەوی و زاری.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆی، یان خێرو شەڕەی رووی تێدەکات یاخود زیادوکەمی ئاوەدانیو وێرانی.
*فڕنو ناتەوای نادیار بەڵگەیە لەسەر ماڵی دەستەلأتدار یان لانەی دادوەر.
*ئاگر دەستەلأتدارە زیانو سوودی هەیە.
*ئەگەر ئاردی جۆ نێردرا بۆ نانەوا لەکالأو شتومەکەکەی بەئەندازەی سەرمایەکەی سوودو قازانجدەکات.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر فڕنو تەنوری ماڵبوو بەڵگەیە لەسەر خاوەن ماڵ یاخود ئەوەی هەڵدەستێ بەپاراستنی بەرژەوەندی ماڵ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گەنجینەو سندووق کەماڵی تێدا دەپارێزێو تەنووریش هەربەو چەشنەیە.
*فڕنی بازاڕ بەڵگەیە لەسەر ماڵو لانەی دادوەر، هەروەها بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی پێداویستی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سوودو قازانج یان چاکبوونەوە لەنەخۆشی.
*ئەگەر هەویرێکی بردە نێو فڕنو نانەواوە نانەکەی یاسەموونەکەی بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی پێداویستیو چاکبوونەوەی لەنەخۆشی، دەگونجێت سەربکەوێت بەسەر دوژمن یان نەیاردا یاخود نەیارەکەی زیندانی بکرێ، یاخود منداڵەکەی فێری پیشەیەکدەکات یان دەیباتە قوتابخانەیەك یان سوودو قازانج بەدەستدەهێنێت لەرزقو رۆزیدا.
*شتوومەکی نێو فڕنو نانەوەخانە بەڵگەیە لەسەر ئامرازو سەربازو پشتگیرەکانی یان ئەو لاوو هەرزانەی بەگەڕیان دەخات لەپیشەکەیدا.
*دەگونجێت فڕن بەڵگەبێت لەسەر بازاڕ.
*ئەگەر گەنم یاجۆی برد بۆ فڕنێکی نادیار ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێو ماڵو سامانەکەی دەبات بۆ دادوەرێك، ئەگەر نەخۆش نەبوو بەلأم باجی میری لەسەربوو دەیداتەوە ، وەگەرنا کالأوشتومەکەکەی دەبات بۆ بازاڕ.



**فلس**[1]: (ئیبن سیرین) دەڵێت: بینینی (فلس) لەدەفرێکدا بەجێهێنانی پێداویستییە، فلسی دیارو بەرچاو قسەو وتەی خراپو دەنگەدەنگە.
*ئەگەر بینی درهەمێکی خستەنێو گەرووی و فلسێکی دەرهێنا خراپەکارە.

---

[1] **فلس**: دراوێکی کانزاییی کەم نرخە. (وەرگێڕ)

* فلس وتەیە لەگەڵ روپامایی‌و دەمەدەمە.
* ئەگەر چەن فلسێکی بینی ناوی خودای لەسەر بوو رێگەی بەخۆیداوە گوێ بگرێ.
* ئەگەر بینی دینارێکی قووتداو کاتێ داینایەوە فلسبوو لەسەر بێباوەڕیی دەمرێ چونکە دینار ئاینەو فلسیش ناپاکی‌و سەرگەردانی‌و بێباوەڕییە.
* هەندێکدەڵێن: فلس بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارەو ناڕەحەتی‌و قسەو وتەیەك غەم‌و پەژارەی بەدوادا بێت.
* هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر بێپارەیی‌و گیرفان بەتاڵی.
(نابلسی) دەڵێت: دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رزقێکی خراپ یان دەروولێکردنەوە دوای ناڕەحەتی یاخود بەگەڕخستنی کارێکی زۆر.
* فلسێکی زۆر هیچ پێنەبوونە لەدادگایی‌و گفتوگۆ لەنێوان زانایاندا یاخود گیرفان بەتاڵییە.

## ف و

**فورات**: (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی لەئاوی (فورات) دەخواتەوە فەڕوپیت‌و سوود لەخوداوەندەوە وەردەگرێ.
* ئەگەر بینی ئاوی (فورات)وشکیکردوە دەستەڵاتدار دەمرێ‌و موڵك‌و دەستەڵاتی بەفیڕۆدەچێت .
* ئەگەر بینی لەئاوی (فورات) دەخواتەوە بەڵگەیە لەسەر زۆری نوێژو بەندایەتی‌و قەناعەتی.

## ف وو

**فووکردن بەئاگردا**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا فیتنەیە، فووکردن بەزەویدا دەرخستنی نهێنییەو داهێنانە بۆ یەکێك نەتوانێ بیشارێتەوە.
* ئەگەر فوویکرد بەعەورەتی ژنێکدا دووگیاندەبێ بەپێی چیرۆکەکەی (مریم) (سەلامی خوای لێبێت).
* فووکردن لەپێناوی چێشتلێناندا بەڵگەیە لەسەر وروژاندنی کارێك لەپێناوی بەرژەوەندیەکدا، ئەگەر بۆ چێشتلێنان نەبوو بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارە.
* فووکردن بەکەڕەنادا قوتاربوونی پیاوچاکانەو، یان حەقێکەو بەڵگەیە لەسەر هەواڵی داچڵەکێنەر، ئەگەر بەتەنیا هەر خۆی گوێی لێبوو دەگونجێت هەواڵەکە تایبەت بێت بۆی، ئەگەر خەڵکی بیستی هەواڵێکە خەڵکی

نیگەراندەكات، ئەگەر گوێی لەفووی دووەمبوو بەڵگەیە لەسەر جوولاندنی بزێوی‌و بوونی شتی شاراوە یان دەركەوتنی نهێنی‌و چاكبوونەوەی نەخۆش‌و قوتاربوونی زیندانی‌و شادبوونەوە بەگەشتیارو موسافیران.

**ف ە**

**فەرامۆشكردنی مرۆڤ:** فەرامۆشكردن بەڵگەیە لەسەر سزا بەپێی ئایەتی ﴿فَمَهِّلِ الكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا﴾.

*ئەگەر بینی پیاوێك لەتوورەییدا فەرامۆشدەكات سزایەكی توندو تیژی دەدات.

**فەرش( قالی - راخەر):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ژنێكی داوێنپاكی خاوەن پلەوپایەیە لەئایندا.

**فەرمانڕەوا( دەستەلاتدار):** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیەلەسەر:

+غەم‌و پەژارە.

+مەی‌وبادەخواردنەوە.

+ئارەزووبازی‌و گاڵتە.

+دزی.

+نێربازی‌و زینا.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ئەمەكداری بۆ خەڵكی‌و خۆشەویستیان، ئەگەر لەوانەبوو خۆیاندەگرتەوە دەچێتە پلەی دەستەلات‌و ئاگاداری نهێنی خراپدەبێت، ئەگەر دادوەربوو بەستەم‌و زۆرداری‌و بەرتیل دادوەریدەكات.

*ئەگەر فەرمانڕەوای بینی لەسەر شێوەی گونجاوو دروست یاخود خۆی بەوچەشنە بینی بەڵگەیە لەسەر دەرەنجام‌و چارەنووس باشی.

*ئەگەر خەوبینەر بەڵێنێكیان پێدابوو بۆی بەدی دێت‌و دەگات بەهیواو ئاواتی خۆی.

*ئەگەر یەكێكبوو بەفەرمانڕەواو شایستە نەبوو بەڵگەیە لەسەر تێكچوون‌و شێوانی حاڵ‌وباری خەڵكی‌و دەرچوونیان لەحەقویستی‌و رووكردنە ستەم‌و زۆرداریی.

*ئەگەر لەخەودا بینی یەكێك لەفەرمانڕەوا ستەمكارەكان مردن بەڵگەیە لەسەر پشوو و هێوری بۆ خەڵكی ئەو ولاتە.

*بینینی فەرمانڕەوا بەڵگەیە لەسەر:

+قسەكردن دەربارەی ئابڕوی خەوبینەر.

+هەركەسێكی پلەوپایەدارو رەچەڵەكدار.

+كوڕ.

+سوننەتو بەجێهێنانی.
+ئایـنـداریو خواناسـیو جیابوونـەوە لەخەڵکی.
+گۆشەگیربوون بۆ بەندایەتی.
+راستگۆیی.
+خۆبەخـشیو دڵو دەروون ئاوەدانکردنـەوە بەتەوبـەو یـادی پەروەردگار.
+باوەڕهێنانی بێباوەڕ.
+فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە.
*ئەگـەر فـەرمانڕەوا لەخـەودا مـرد یـا جـوانیو رازاوەیـی دەوروبـەری گـۆڕا بەڵگەیەیە لەسەر کـەمو کوڕی ئـەوەی بەڵگەیە لەسەری.
*ئەگـەر بینـی بـوە بەفـەرمانڕەواو شایـستەی فـەرمانڕەواییبوو پێیدەبەخـشرێ، وەگـەرنا نەخۆشـدەکەوێت یـان زینـدانی یـاخود سەفەرێکی دوور دێتـە رێـی یـان مـافو حـەقێك بـەجێناهێنێ بـۆ خـۆی یامـافی خوداوەند پێشێلدەکات.
*دەگونجێـت لەسـەرەتای تەمەنیـدا لاوازو بێزاربێـتو لـەکۆتایی تەمەنیـدا شادو خۆشحاڵ بێت.
*ئەگـەر بینـی خوداوەنـد کردوویـەتی بەفـەرمانڕەوا لەسـەر زەوی ئەگـەر شایـستە بێـت وەریـدەگرێ، وەگـەرنا دەکەوێتـە فیتنـەو ئاشـوبەوەو تێـدا خوێنرێـژێك لـەناو دەچێـتو زانـستپەروەرو خواناسـان رزگاریـان دەبێت.
*ئەگـەر بینـی بـوە بەفـەرمانڕەواو پێـشەوا رێـزو شـکۆمەندی بەدەستدەهێنێت یاخود فەرمانڕەواییو پێشەوایەتی بەمـەرجێك شایستەبێت، ئەگـەر شایـستە نـەبێت ملکەچـیو سەرشـۆڕی رووی تێـدەکاتو کاروبارەکـانی پـەرتو بڵاودەبنـەوە تەنانـەت ئەوانـەی لەبەردەسـتیدابوون بەرزدەبنـەوە بەسـەریاو دوژمنـانی گاڵتەی پێدەکەن.
*ئەگەر وایبینی فەرمانڕەوای کوشتوە داوای کارێکی مـەزنو گـەورە دەکاتو زاڵدەبێت بەسەریا.
**فـەرمانکردن بەچـاکە:** فـەرمانکردن بەچاکە لەخەودا وەك ئەوە وایە فەرمان بکـات بەنوێـژکردنو وتنـی شـەهادەو ئامۆژگاریکردنیـان، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسەر باوەڕهێنان بەخواو بـەجێهێنانی سەرجەم مافەکانیتر، ئەگەر شایـستەی فـەرمانڕەواییبوو بەدەسـتیدەهێنێت یان دەستەڵاتی پێدەدرێت.
*ئەگەر لەخەودا بینـی ئـارەقی رشـتو ئـامێری مۆسـیقای شـکاندو عەباکـەی

فرێدا یان کارێکی هاوچەشنی ئەوەیکرد بەڵگەو نیشانەیە لەسەر باوەڕو دامەزراندنی لەسەر دەستی ئەودا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ڕوودانی کارەساتێك ئارامو دان بەخۆگرتنی پێویستبێت.

*هەروەها فەرمان بەخراپەو ڕێگری لەچاکە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دووڕوویی.

**فەروو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: فەروو لەهاویندا خێرو دەوڵەمەندییە بەدەستی دەهێنێتو لەهاویندا خێرێکە بەغەمو پەژارە دەستیدەکەوێت.

*پێستی ئاژەڵان دەرکەوتنی هێزو توانایەتی، پێستەی ئاژەڵی درندەش وەك ڕێویو سمۆرە بەڵگەیە لەسەر پیاوانی تاریکایی، هەروەها دەڵێن: بەڵگەی شکۆداریو نرخە.

*لەبەرکردنی فەروو بەهەڵگەڕاوی دەرخستنی ماڵێکی شاراوەیە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی فەروویەك چاکدەکات خراپەیەك ڕووی تێدەکات لەلایەکەوە نەیزانیوە.

*فەرووی ئاژەڵی درندە وەك ڕێویو سمۆرە بەڵگەیە لەسەر پیاوانی نێوەندی تاریكو تراویشە: بەڵگەی شکۆو بەنرخییە.

## ف ی

**فیتنە (ئاشووب):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵو منداڵە بەپێی ئایەتی: ﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾ (الأنفال: **٢٨**).

*ئەگەر بینی ماڵو منداڵی هەیە دەکەوێتە نێو فیتنەوە.

**فیرعەون:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دوژمنی ئاینە، ئەگەر فیرعەونی لەباشترین حاڵدا بەدیکرد خراپی حاڵی سەرەڕۆو نەتەوەکەیەتی، هەروەها باشی حاڵی فیرعەون باشی حاڵی سەرکردەو نەتەوەیە.

*ئەگەر بینی وەك هەندێك لەفیرعەونەکانی دنیای لێهاتوە هێزو تواناو ئەمەکداری پێدەدرێ بەلام تێکچوونی ئاین ڕووی تێدەکات، هەموو دوژمنێکی پیاویش بەو چەشنەیە.

*ئەگەر بینی هەندێك لەفیرعەونە مردوو ستەمکارەکان لەشارێکدان ناوبانگی ئەوکەسە لەو شوێنەدا سەرهەڵدەدات.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: بینینی هەموو فیرعەونێك لەخەودا بینی دوژمنی ئیسلامە، باشی حاڵی خراپی حاڵی موسوڵمانانو سەرکردەکەیانە، ئەمەش بنەڕەتیو بەردەوامە، هەرکەس

دوژمنەکەی لەخەودا ببینێ بەحاڵو بارێکی خراپەوە لێکدانەوەی باشی حاڵیەتی.

* هەرکەس دوژمنەکەی بەحاڵێکی باشەوە ببینێ لەلێکدانەوەدا تێکچوونی حاڵیەتی.

* ئەگەر بینی وەك یەکێك لەفیرعەونەکانی دنیای لێهاتوە، هێزو توانا بەدەستدەهێنێو ناوبانگی هاوتای ناوبانگی ستەمکاراندەبێو لەسەر شەڕو خراپە دەمرێ.

* هەروەها ئەگەر بینی هەندێك لەمردوە ستەمکارەکان لەشارەکەی ئەودان ناوبانگی لەوشارەدا بڵاودەبێتەوە.

**فیکە**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نواندنی رەوشی هاوەڵپەیداکاران، چەپڵەش بەو چەشنەیە.

* دەگونجێت ئەنجامدانی ئەوکارە بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی زەردوویی یاخود چۆڵکردنی ماڵو لانە.

**فیل**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: سەبارەت بەفیل رای جۆراو جۆرهاتوە، هەندێکدەڵێن: فەرمانڕەوایەکی مەزنو گەورەیەو هەندێکی دی دەڵێن: پیاوێکی نەفرەت لێکراوی شێواوە.

* دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرین) و دەڵێت: لەخەودا خۆم بەسواری فیلێکەوە بینیەوە ، (ئیبن سیرین) وتی: فیل لەو ئاژەڵانە نییە موسوڵمانان سواری دەبن دەترسم تۆ لەسەر ئاینی ئیسلام نەبیت.

* هەروەها دەڵێن: شتێکی بەناوبانگەو هیچ سوودێکی تێدا نییە چونکە گۆشتی ناخورێو شیریشی نادۆشرێ.

* هەندێکیتر دەڵێن: ئەگەر فیلێکی بینیو سواری نەبوو کەمو کوڕی روودەکاتە دەروونیو ماڵو دارایشی زەرەردەکات. ئەگەر سواریبوو دەستەڵاتێکی گەورەی رەهای پێدەسپێرێو زاڵدەبێت بەسەریا ئەگەر شیاوی دەستەڵاتبێ، ئەگەر شیاووگونجاو نەبوو جەنگو شەڕ رووی تێدەکاتو سەرناکەوێت چونکە سوارەکەی هەمیشە لەماندوبووندایە بۆیە سەر ناکەوێتو خوداوەند دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ﴾(الفيل: ١).

* دەگونجێت بکوژرێت تێیدا ، ئەگەر بەزینەوە سواری ببێتو بەگوێی بکات کچی پیاوێکی عەرجەمی گەورە دەهێنێ، ئەگەر بازرگانبوو بازرگانیەکەی گەورەو مەزندەبێت.

* ئەگەر بەرۆژ سوارییوو ژنەکەی تەلاقدەداتو خراپە بەهۆی ئەوەوە تووشدەبێت.
* ئەگەر فیلی رامکرد فەرمانڕەوایانی عەجەم رێکدەخاتو بەگوێی دەکەن بەئەندازەی گوێڕایەڵی.
* ئەگەر بینی فیل دەدۆشێ پلاندەگێڕێ لەدژی فەرمانڕەوایەکی مەزنو ماڵوسامانێکی حەلاڵی لێوە دەستگیردەبێ. پاشەڕۆی فیل ماڵو سامانی پادشایە.
* ئەگەر کوژراوێکی لەشارێکدا بەدیکرد فەرمانڕەوای ئەو شارە یان پیاوە مەزنەکانی دەمرن.
* ئەگەر بینی فیلێك هەڕەشەی لێدەکات یان بەدواوەیەتی ئەوە نەخۆشییە.
* ئەگەر بینی خستییە ژێر پێلەقەی یان خستییەسەر خۆی بەڵگەیە لەسەر خەونی خەوبینەر ، ئەگەر نەیخستە ژێر خۆی روو لەناڕەحەتیدەکات بەلام قوتار دەبێ لێی.
* هەروەها دەڵێن: فیل لەئاژەڵەکانی دۆزەخە.
* بۆ ژنان بەڵگەی خێرنییە بەهەربارێکدا ببینێ، هەروەها دەڵێن:

ئەگەر بینی وتوێژ لەگەڵ فیلدا دەکات لەدەستەلات خێرێکی گەورەی دەستگیر دەبێ.
* ئەگەر بینی بەغارەوە فیل شوێنی کەوت زیانی لەلایەن فەرمانڕەواوە پێدەگات.
* ئەگەر بەلووتی لێیدا سامانو گەنج بەدەستدەهێنێت.
* هەروەها دەڵێن: بینینی فیل بەدەر لەولاتی (هند) ناڕەحەتیو ترسو بیمە.
* کوشتاری دوو فیل جەنگو شەڕی نێوان دوو فەرمانڕەوایە بەزۆری فیل بەڵگەیە لەسەر دەستەلاتدارێکی عەجەمی.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنێکی کەتەولی لەشولار گەورە یان کەشتیەکی گەورە.
* هەروەها بەڵگەیە لەسەر وێرانیو کاولبوون.
* ئەگەر بینی فیلێك لەشارێك بەدەرچوو فەرمانڕەواکەی نەخۆشبوو دەمرێ، وەگەرنا سەفەردەکات لێی یان لادەبرێ یاخود لەسەر پشتی کەشتیەك سەفەر دەکات ، وەگەرنا نەخۆشیو تیاچوون لەسەریان لادەچێت بەلاچوونی فیل.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی عەجەمییە بەسامو هەیبەتو دڵساردەو ئەرك هەڵگرەو ئاگاداری هونەری جەنگە.

*ئەگەر شەو سواری فیلبوو بەسەرجەم ئامرازەکانییەوە گوێڕایەڵو رامبوو زاڵدەبێت بەسەر فەرمانڕەوایەکی چرووکدا ئەگەر خەوبینەر لەدەستەلاَتدارانبوو، ئەگەر دەستەلاَتدارنەبوو جەنگ رووی تێدەکاتو سەرناکەوێت چونکە سوارەکەی هەمیشە لەپلانو نارەحەتیدایە.

*ئەگەر بینی بانگی چەندین فیلدەکات پادشایانی عەجەم کۆکدەکاتو بەئەندازەی رامبوونی فیلەکە گوێڕایەڵی بۆ دەنوێنن.

*ئەگەر بینی فیل دەدۆشیٚ ناپاکیو پلاندەگێڕیٚ لەدژی فەرمانڕەوایەکی گەورەو ماڵێکی حەلاَڵی لێوە دەستگیردەبیٚ، هەروەها ئەگەر بینی لەلووتی شتێکی گرت ماڵی حەلاَڵی دەستگیردەبیٚ.

*دەڵێن: فیل پادشایەکی فرە نازو نیعمەتدارەو بەرێزو ئارامو چاودێریو نەرمو نیانە.

*هەروەها فیل بەڵگەیە لەسەر:

+نەتەوەچاکەکان.

+زانایان.

+خەڵکی خاوەن کەسایەتی.

+بەلاَو نەهامەتی.

+ماندوبوون پاشان قوتاربوون لێی چونکە فیل بەنارەحەتی لەدایکدەبێت.

*ئەگەر فیلێکی بینیو سوارینەبوو کەموکوڕی روودەکاتە دەروونیو زەرەر لەماڵو داراییدەکات، ئەگەر بینی سوارییوو موڵکو دەستەلاَت بەدەستدەهێنیٚ.

*ئەگەر فیلی لەولاَتی بەربەریەکان دی بەڵگەیە لەسەر نارەحەتیو ترس‌وبیم، یاخود بەڵگەیە لەسەر فەرمانڕەوا یان پیاوێکی رێزدار.

*ئەگەر ژنێك بینی سواری فیلێکبوە بەڵگەی مردنیەتی.

*ئەگەر بینی سواری فیلێك بوە لەجەنگدا دەمریٚ.

*ئەگەر بینی گۆشتی فیل دەخوات ماڵو سامان لەفەرمانڕەواوە بەدەستدەهێنێت، بەهەمان شێوە ئەگەر هەر ئەندامو بەشێکی فیلەکەیبرد بەوچەشنەیە.

*بینینی فیل بۆ خواناسو چاکەکاران باش نییە، بەلاَم بۆ دنیا پەرستان

بەڵگەیە لەسەر دەستەڵاتداری عەجەمی.

*ئەگەر بینی فیلێکی کوشت پیاوێکی عەجەمییە.

*ئەگەر چەندین نەتەوەی بینی سواری فیلبوون و بەرێوەی دەبەن ئەگەر لەجەنگدابوون دەبەزن.

*دەگونجێت بچێتە لای ژنێکی عەجەمی ئەگەر لەسەر شێوەی سواربوون سواری نەبێت و لەزەوی و زاری جەنگیش نەبێ.

*ئەگەر بینی فیلێک هاتووە لەشارێکەوە بۆ شارێکیتر دەستەڵاتدارێکە جوولێنێ لەشارێکەوە بۆ شارێکی دی.

**فیلەوان:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پەروەردەکاری منداڵی فەرمانڕەواو سەرکردەکان وەک زمانەوان و فێرکاری سوارچاکی یاخود زۆرانبازی و مەشقی جەستەیی.

**فیلی شەترەنج:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر رابواردن و ئارەزوو یاری و ناتەواوی لەش و لار بۆ یەکێک خوازیاری جموجووڵی بیت لەکاتی پێویستداو یان دانیشتن و نەجوولان لەکاتی هەوڵ و جوولاندا.

## فێ

**فێرکردنی مرۆڤ:** (نابلسی) دەڵێت: فێربوونی مرۆڤ بۆ قورئان یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) یاخود داناییەک یا پیشەیەک بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی دوای هەژاری و رێنومایی دوای وێڵی و سەرگەردانی.

*ئەگەر خەوبینەر رەبەنبوو هاوسەر دەگرێت یاخود خوداوەند منداڵێکی پێدەبەخشێت یان هاوەڵایەتی یەکێک دەکات رێنومایی دەکات و دەستیدەگرێت بۆ رێگەی حەق و راستی.

*ئەگەر فێری دزی یا داوێنپیسی و بێباوەڕیبوو بەڵگەیە لەسەر وێڵی و سەرگەردانی دوای رێنومایی یا هەژاری لەدوای دەوڵەمەندی یاخود رێگەی دەوڵەمەندی دەگرێتەبەر یان پاشگەزدەبێتەوە دوای باوەڕهێنان (پەنا بەخوا).



# قاف

## قا

**قابلەمەی گەورە:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ژن‌و خزمەتکار، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رزق‌و رۆزی.

**قابیل(کوڕی ئادەم):** (نابلسی) دەڵێت ئەگەر لەخەودا بینی زاڵدەبێت‌و کەسێك بەبێ حەقدەکوژرێ‌و خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾ (المائدة:٣١).

**قاپ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سەرجەم قاپی مس خزمەتکارە لەبازرگانیشدا لانەو خانووە.

*هەروەها دەڵێن: تاس‌و دەفر بەڵگەیە لەسەر جوانی رێکخستن‌و بەڕێوەبردنی مرۆڤ.

**قاپقاپ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا تەوبەیە بۆسەرپێچیکار یان دژایەتی‌و شەڕە یاخود زانیارییە یا دەرخستنی نهێنییە بۆیەکێك بیەوێت بشارێتەوە.

*ئەگەر بینی بەقاپقاپێکەوە دەیەوێت بڕوات‌و باغەبوو فتنەیی‌و دووڕوویی هاوەڵەکەیەتی.

**قاپی شیردۆشین:** (نابلسی)دەڵێت: رزق‌و رۆزییەکی خۆش‌و بەتام‌و چێژە.

**قاچ( لاق ):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا تەمەنی مرۆڤو پشت‌و پەنایەتی لەپەیداکردنی بژێویدا.

*ئەگەر بینی قاچێکی بەرزکردەوەو یەکێکی درێژکرد، ئنجا هەردوو قاچی لەیەك ئالاّ چارەنووس‌و ئەجەلی نزیکە یاخود کارێکی قورس‌وگران رووی تێدەکات یان درۆزندەبێت.

*ئەگەر لاقی ژنێکی بینی‌و پاشان ناسی دەیکات بەهاوسەری خۆی یان یەکێکیتر دەهێنێت ئنجا روو لەخێرێکی باشتردەکات لەوەی خۆی لەسەریەتی.

*ئەگەر موویەکی زۆری بەقاچەکانیەوە بینی قەرز لەسەری کۆدەبێتەوەو لەزیندانا دەمرێت.

*ئەگەر بینی شەلبوە زینادەکات.

*قاچ ماڵی مرۆڤو بژێویەتی، ئەگەر بینی قاچی بوە بەئاسن ماڵو دارایی دەمێنێتەوەو تەمەندرێژ دەبیٚ، ئەگەر قاچی لەداربوو لەبژێوی پەیداکردندا لاواز دەبێت ، ئەگەر قاچی لەشووشەو گلێنەبوو زۆر ناخایەنێت دەمرێتو ماڵو بژێوی تیادەچێت، ئەگەر کورو ئاژەڵ ئوتومبیلو ماڵو دارایی هەبوو هەندێکی لەکیسدەچێت، دەگونجێت کەمو کورپیبێت لەتەمەنیدا.

*ئەگەر بەیەك قاچەوە رۆیشت نیوەی ماڵو داراییەکەی بەفیڕۆدەچێت.

*ئەگەر بینی هەردوو قاچی براوە سەرجەم ماڵو دارایی دەڕوات، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مەرگی مەگەر لەخەونەکەیدا شتێکی تیابێت بەڵگەبیٚ لەسەر خێر ئەوجا بەئوتومبیل یان ئاژەڵێك خەلآت دەکریٚ، یاخود بەڵگەیە لەسەر سواربوونی کەشتی کرێگرتە یان کەشتی هاوڕێیەکی، یان روو لەخراپەدەکاتو کاری حەرامو یاساغ ئەنجامدەدات.

*ئەگەر قاچێکی جوانو قەڵەوی دی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خودی خۆیو چۆنیەتی بەکارهێنانی لەباشەدا یان باشی ئەو ماڵو داراییەی بەدەستیهێناوە.

*گردبوونەوەی موو بەقاچی ژنەوە بەڵگەیە لەسەر سەرشۆڕیو فێڵو تەڵەکە مێردەکەی پێیدەکات یان بەرپرسو فەرمانڕەوا.

*دەگونجێت گردبوونەوەی موو لەسەر قاچی ژن بەڵگەبێت لەسەر دەرکەوتنی نهێنیو ڕێنومایی دوای وێڵیو سەرگەردانی.

*دەگونجێت قاچ بەڵگەبێت لەسەر ناڕەحەتی.

*ئەگەر دووقاچی بینی لەیەك ئالآبوون بەڵگەیە لەسەر ترسو بیمو نەهامەتی.

*گۆڕانی حاڵوباری لاق بەڵگەیە لەسەر دەستگرتن بەسەر ماڵی کەسانیتردا یان ئەوەی بەدەستیدەهێنێت.

*دەرخستنی قاچ بەڵگەیە لەسەر وازهێنان لەنوێژو ملکەچی دوای شکۆمەندی.

**قاچی مرۆڤ:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: قاچ هۆی بژێویو ماڵو دارایی پیاوە، دەگونجێت تەمەنی خاوەنەکەی بێت.

*ئەگەر بینی قاچی لەئاسنە تەمەنی خاوەنەکەی درێژدەبێتو ماڵو دارایشی دەمێنێتەوە.

*ئەگەر قاچی بوبوو بەدووپوگەوهەر زۆری پێناچێت دەمرێتو ماڵو دارایشی بەسەردەچێت.

* ئەگەر بینی قاچی قرتاوە نیوەی ماڵو سامانی تیادەچێت ، ئەگەر هەمووی بڕا هەموو ماڵو سامانەکەی تیدەچێتو هێزو توانای نامێنێت ، یان هەمووی دەمرێت ئەگەر لێی جیابوەوە.
* هەروەها دەڵێن: هەردووقاچ باوكو دایکن ، ڕۆیشتن بەپێی پەتی بەڵگەیە لەسەر ماندویەتیو نارەحەتی.
* هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی چەند قاچێکی هەیە ئەگەر لەسەفەردابوو سەفەرەکەی بۆ ئاساندەبێتو خێری دەستگیردەبێت، ئەگەر هەژاربوو گەنجو سامانی دەستدەکەوێت، ئەگەر دەوڵەمەندبوو نەخۆشدەکەوێ.
* بینینی هەردوو قاچ بەخەتو نەخشونیگارەوە مەرگی خانەوادەیە، بۆ ژنیش مەرگی مێردەکەیەتی.
* ئەگەر بینی قاچی بەرزکردوەتەوەو یەکێکیان ئالاوە لەوەی دیکەوە چارەنووسو ئەجەلی نزیکبوەتەوەو ڕووداوێکی قورسوگران ڕووی تێدەکاتو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خەوبینەر درۆزنە.
* بینینی پیاو بۆ لاقو قاچی ژن بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری.
* دەرخستنی لاق لەلایەن ژنەوە باشی ئاینو بەدەستهێنانی خێرێکی گەورەیە.
* پاژنەپێ کوڕێکی قومارچییە.
* هەروەها دەڵێن: پێشهاتنی مەرگ یان غەمو پەژارەیەو پاژنەشکانیش هەوڵدانە لەکارێکدا پەشیمانی دەبەخشێ بەخاوەنەکەی.
* قاچ جوانی پیاوو ماڵو سامانەو پەنجەکانی کچو خزمەتکارەکانیەتی.
* ئەگەر هەندێك لەپەنجەکانی بینی بەرزبوەتەوە رووبە ئاسمان هەندێك لەبەردەستو کیژەکانی دەمرن.
* مووی قاچ قەرزێکی زاڵە، ئەگەر بینی هەردوو قاچی ڕوو بەئاسمان بەرزبوونەتەوە هەردوو کوڕەکەی دەمرن.
* ئەگەر بینی بەقاچی زینادەکات بەحەرامی دوای ژنان دەکەوێ.
* ئەگەر بینی چەن قاچێکی هەیە ئەوەبۆ :
+دەوڵەمەند نەخۆشییە.
+بۆ دڕندەو بەد خوو بەڵگەیە لەسەر زیندانیو کۆتو بەندکردن.
* پیاوێك بینی قاچێکی بوە بەبەرد، پاش ماوەیەك ئەو قاچەی وشکبوو.

*دەگێڕنەوە پیاوێك هات بۆ لای (ئیبن سیرین)و وتی: بەقاچی پیاوێکەوە تووكو موویەکی زۆرم بینی، ئەویش وتی: قەرزار دەبیۆ لەزیندانا دەمرێ.

*پیاوێك بینی شەلبوو لەخەودا، راڤەکارێکی خەو پێی وت: تۆ زینادەکەیت، دواتر لەگەڵ ژنێکدا دەستگیرکراو کاری داوێنپیسیدەکرد.

*پیاوێك هات بۆلای (ئیبن سیرین)و وتی: پەنجەکانی خۆم بینی لەسەر پشکۆ ، کاتێ قاچم دەخستەسەری پشکۆکە دەکوژایەوە ، کاتێکیش بەرزمدەکردەوە وەك خۆی لێدەهات، راڤەکارەکە پێی وت: کەسێکی ئارەزووبازە، ئەویش وتی: نەخێر وانییە بەڵکو پیاوێکە باس لەچارەنووسدەکات، ئەویش وتی: چ شتێك لەچارەنووس قورسترە.

*ژنێك بینی پەنجەگەورەی قاچی قرتاوە ئەم خەونەی بۆ (ئیبن سیرین) گێڕایەوەو ئەویش وتی:پەیوندی لەگەڵ کۆمەڵێك دروستدەکەیتەوە پێشتر پەیوەندیت لەگەڵیان بچڕاندوە.

*پەنجەکانی هەردوو قاچ ماڵو دارایی خاوەنەکەیو کرداری چاکەیە.

(نابلسی) دەڵێت: قاچ پەناوپشتگیرو هۆکاری رۆیشتنی پیاوە، بۆیەلێکدانەوەی وەك لێکدانەوەی ماڵەکەیەتی، قاچ ماڵو جموجوڵیەتی لەکاتی نهێنیو ئاشکرادا.

*ئەگەر بینی هەردوو قاچی روو بەئاسمان چوونو لێی جیابوونەوە باوکی دەمرێت.

*ئەگەر بینی سەوزبوون سەرشۆڕی دەکەوێتە نێو ماڵو دارایی.

*ئەگەر بینی بەپێی پەتی دەڕوات هیلاکیو ماندوبوون رووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی قاچی مرۆڤێك دەخوات نزیکی لەخوداوەند دەستگیردەبێتو کاروبارەکانی سەر دەگرنو سەرجەم پێداویستیەکانی بۆ بەدەستدێت لەئاینو دنیادا.

*ئەگەر بینی هەردوو قاچی دەسووتێن ئەوەی کەخاوەنێتی دەگۆڕێتو بەو چەشنە نامێنێت.

*ئەگەر بینی چەن قاچێکی هەیە بۆیەکێك ئارەزووی سەرکردایەتی بکات بەدەستیدەهێنێت، بۆ کەشتیەوان سەفەرە لەگەڵ سوودو قازانجێکی زۆر، بۆ هەژاران شتومەکێکە خێری لێ رەچاو ناکرێ، بۆ کەسی چاوکز کوێرییە بۆ خەڵك درندە زیندانیو غەمو پەژارەو گلەییو سەرزەنشتە.

*ئەگەر قاچی رێك بێت یان پەنجەكانی زۆربن شكۆمەندیو رێز بەدەستدەهێنێت لەگەڵ هێزو توانادا.
*ئەگەر بینی قاچی شكا با تاچەند رۆژێ لەدەستەڵاتدار نزیك نەبێتەوەو لەولاتی خۆی دووربكەوێتەوەو داوای لەشساغیو پارێزراوی لەخوداوەند بكات، هەروەها دەڵێن: ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێت.
*ئەگەر بینی قاچێكی لەوی دی درێژترە سەفەر دەكاتو كۆمەكو یارمەتی وەردەگرێ.
*ئەگەر دەوڵەمەندبوو نەخۆشدەكەوێ.
*قاچ بۆ فەرمانڕەوا بەڵگەیە لەسەر پیاوەكانی .
*ئەگەر فەرمانڕەوایەك بینی قاچی فەرمانڕەوایەكیتری قرتاند پیاوەكانی دەبات بۆ خۆی.
*ئەگەر بینی چوارقاچی هەیە ئەگەر هەژاربوو سەفەردەكاتو یارمەتی وەردەگرێ، ئەگەر دەوڵەمەندبوو نەخۆشدەكەوێ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژیو پیری یاخود سواری ئاژەڵو ئوتومبیل دەبێت، بۆنەخۆشیش بەڵگەیە لەسەر مەرگی.
*ئەگەر بینی لەسەر یەك قاچ دەڕوات بەڵگەیە لەسەر رۆیشتنی نیوەی ماڵەكەی یاخود نیوەی تەمەنی یا نیوەی كاروبارەكانی.
*ئەگەر بینی لەسەر سێ قاچ دەڕوات نامرێت تا بەگۆچان نەڕوات بەڕێوە بەهۆی پیرییەوە یان بەهۆی نەخۆشییەك كەدێت بەسەریا.
*ئەگەر دادوەرو فەرمانڕەوا بینیان چەند قاچێكیان هەیە لەكاردەخرێنو كاروباریان بەوەكیل دەڕوات بەڕێوە.
*ئەگەر بینی قاچی لەرزیوە لەبەدەستهێنانی ژندا هەوڵدەدات، ئەگەر بینی لەمسە لەپووچیو هیچدا بەگەڕیاندەخات، ئەگەر بینی لەقورقوشمە بەڵگەیەلەسەر لەكاركەوتن یان گۆجیو ئیفلیجی مەگەر لەخەونەكەیدا هۆكارو رووداوێكی تیابێت بەڵگەبێت لەسەر خێر ، ئەوجا هەوڵدەدات لەپێناوی رەزامەندی پەروەردگاردا یاخود رامیاندەكات لە بۆ پەروەردگار.
*ئەگەر بینی گۆشت بەقاچەكانیەوە نەما بەڵگەیە لەسەر گەورەییو پیریی، پەنجەكانی قاچیشی بەڵگەیە لەسەر كاروكرداری چاكە.
*ئەگەر بینی قاچەكانی ئازاریدەدەن لەكاری خراپدا هەوڵدەداتو سزاو خەشمی خوداوەند دادەبەزێ بەسەریا.

*هەروەها دەڵێن: ئەگە بینی قاچی ئێش‌و ئازاری هەیە لەبارێکەوە دەچێت بۆ بارو حاڵێکیتر.

**قارەمان**[1]: (ئیبنس یرین) دەڵێت: قارەمان پیاوێکی زانای پارێزەرە.

**قاز**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: قاز ژنی بەلەش‌و لارو خاوەن ناوبانگ‌و ماڵ‌و داراییە، ئەگەر لەشوێنێکدا دەنگیان بەرزکردەوە قیژەو هاواردەکەن.

*ئەوەی ببینیٚ قاز بەخێو دەکات لەدوای کۆمەڵێکی پلەوپایەدارەوە دێت‌و لەلای ئەوانەوە ماڵ‌و دارایی بەدەستدەهێنێت چونکە قاز وەك دەڵێن: پیاوێکی خەم‌و خەفەتباری بەدەستەلاتە لەگشت لایەکدا.

*ئەوەی لەدەریادا باڵندەیەك بگریٚ کوڕێکی دەبێت.

(نابلسی) دەڵێت: قاز دوو جۆرە، قازی ماڵی‌و کێوی، قازی کێوی بەڵگەیە لەسەر گەشتیارو بازرگانی دەریاو وشکانی، قازی ماڵیش خانەوادەیە یاخود خەم‌و خەفەت‌و هاوسەر یان ماڵ‌و دارایی‌و خزمەتکار.

*دەگونجێت قاز بەڵگەبێت لەسەر ژنی جوان یاخود ژنی گۆشتن ، دەنگیشی خەم‌و خەفەتە بەهۆی مردن یان ئاگرکەوتنەوە یا نغرۆبوون.

*هێلکەی قازیش ماڵ‌و دارایییەکی زۆرە.

**قالۆنچە( خلێنکە )**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: قالۆنچە پیاوێکی قیناوی دڵپیسیەو دەبێت بەهاوەڵ لەسەفەرداو ماڵ‌و دارایی لەشوێن‌و جێگەیەکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ شوێن‌و جێگەیەکیتر ، هەروەها: دوژمنە یا خاوەن ماڵ‌و دارایی حەرامە.

**قاڵبساز**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر جیاکاری حەقەو ناحەق.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شۆرەر یاخود ئوتوچی‌و جلشۆرو هاوچەشنەکانی.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ماڵ‌و دارایی بەفیڕۆدەرو کەسێك نهێنی پارێزی‌و بەڵێن‌و پەیمان بەجێنەهێنیٚ.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر:

+رەخنەگر چاك لەخراپ دەردەهێنیٚ.

+راڤەکاری خەو چونکە خەوی دروست‌و گونجاو لەخەوی تێکەڵ‌و پێکەڵ جیادەکاتەوە.

---

[1] **قارەمان**: کەسێکە زاڵبێت بەسەر ئەوانەی ژێردەستی خۆیدا. (وەرگێڕ)

*هـەروەها پیاوێکـە قـسەی خـراپ دەکـرێ بەرانبـەری یـان پیاوێکـە دەستەلاتو پلەوپایەی پێدەسپێردرێ.

**قامچی:** (نابلسی)دەڵێت: دەستەلاتو فەرمانڕەواییـە، ئـەوەی ببینـێ دەستەلاتدارو فەرمانڕەوایەك خـاوەن قامـچییە پۆسـتو دەسـتەلاتێکی پێدەسپێردرێ.

*قامـچی بەڵگەیـە لەسـەر ئـەدەبو رەوشـتبەرزی لەگـەڵ شـوێنکەوتنی سـوننەتو پلەوپایـەو پۆسـتو دەستەلاتە بۆ یەکێك خاوەنی بێت.

**قامیش:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر لەخـەودا قامیـشێکی بینـی خۆیـدا بەسـەریا تەمـەنی کـەمێك مـاوەو هەژاردەکـەوێ بەهـەژاری دەمرێـت، هەمووشتێکی ناو بەتاڵ نامێنێتەوە.

*قـامیش دووزوبانییـە یـان مرۆڤێکـی بێئاینـە ئەمەکـداریو وەفـای نییـە، هەروەها دەڵێن: سووكو رسواو گوفتـار خراپە.

*بـەلام قامیـشی شـەکر ئەگـەر بینـی دەیمـژێ رووداوەکاتـە کاروبارێـك قـسەوباسی زۆری تێـداکرێو دەوترێتـەوە بـەلام گوفتـاری ئـەو دەگمەندەبێت.

*ئەگـەر بینـی دەیگوشـێ لـەموڵكو دەسـتەلاتەکەی فـەرپوپیت بەدەستدەهێنێت، ئەگەر ئاگر لێی نەدا بەشەربەت وەردەگیرێ چونکە سوودو قازانجی شەربەت زاڵە بەسەر شتیتردا.

*قامیـشی شـەکر وتنـەوەی گوتـەو قسەیە کەباشو شیینە. یەك شەکریش ماچی خۆشەویست یان کوڕە، شەکری زۆریش بەڵگەیە لەسەر وتی وتی.

(نابلـسی) دەڵێـت: بینینـی قـامیش بەڵگەیـە لەسەرچـواندنو چـاولێکردنو رووپامایی لەکرداردا.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەرکاری سووكو بەدەستهێنانی بەشـەڕو ئـاژاوە یـان خۆشـیو تـامو چێژ یان شـتێکی دەگمەن.

*قامیـشی فارسـیو ئـەوەی لێیدروسـتدەکرێ بەڵگەیـە لەسـەر رەواندنـەوەی غـەمو پـەژارەو خۆشنوودی.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر دەرکەوتنی خراپـەکارو وتنـی گوفتـاری زۆر رووپامایی لەکرداردا.

*ئەگـەر قامیـشەکە بـوو بەئاسـنی زینـدانو لـەزیو یـان زێـڕ یـاخود زومورڕدبوو بەڵگەیە لەسەرکاری چاکەی مرۆڤ کەبەهۆیەوە دەگات بەبەهەشتو چوونە نێو کۆشکەکانی.

*هەروەها قامیش کۆمەڵێ دووڕوە ئەگەر دەنگی هەبوو شەڕو ئاژاوەیە.

*قامیشی شەکر بەڵگەیە لەسەر رزق و رۆزییەك بەنارەحەت بەدەستدەهێنێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+دەنگەدەنگ لەخراپەدا یان ئەو شوێنانەی تێدا دەبینرێ.

+رێزداری لەرەچەڵەکدا.

+زانیاری بەسوود وەك یەکتاپەرستی بناغەی خێرە.

+ژنی داپۆشراوی بەرێزو پایەدار.

+ئەوپیاوانەی ئەرکی رۆژوو یان خزمەتگوزاری بەجێدەهێنێت.

*دەگونجێت ئەگەر لەشوێنی خۆیێ نەڕوێنرابێ بەڵگەبێت لەسەر وێرانبوونی شوێنێك و رەواندنەوەی شوێنەواریەو دەرخستنی حاڵی خانەوادەی یان کۆبوونەوەی ژنان و گریان و شیوەن و دەرخستنی سەرو فرمێسك رشتن. ئەوەشی کارێکی بۆ بەجێبێت بۆی دەشاردرێتەوە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر چەککردن و بڵاوبوونەوەی بەیداخ و ئاڵای جۆراوجۆر.

*بینینی بەڵگەیە لەسەر قوتاربوونی زیندانی و ئازادبوونی دیل و چاکبوونەوەی نەخۆش و دەرهێنانی مردوو لەکوڕەکەی.

**قامیشی کەتیرەی سەوز:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: قامیشی کەتیرە بەڵگەیە لەسەر تیاچوون یان ئەوەی شتێکی تیابردوە.

(نابلسی) دەڵێت: راوکاری باڵندەیە.

**قاووقیژ( دەنگەدەنگ ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بینینی فیتنە یاخود بۆنەکانی ساڵ یان کاروبارێکی گرنگ خەڵکی بۆ کۆدەبێتەوە لەهەموو لایەکەوە.

**قاووقیژکار:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر قاووقیژو دەنگەدەنگ لەشەڕوخراپەدا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گواستنەوەی شارەزایی لەرەچەڵ و هۆزوتیرەو هەر زانیارییەکیتر بۆ پیشەیدی.

*دەگونجێت خەونەکەی بەڵگەبێت لەسەر هەڵگرتنی شوێنەوارو ئەوەی وتەکانی جێبەجێناکات.

**قایشی پێڵاوەران:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کوڕە ئەگەر قایشی لەپشتی خۆیدابینی خواناسدەبێ و ئاینی خودا سەردەخات.

*ئەگەر قایشی لەگەڵ جل وبەرگی نوێدا بەدیکرد کوڕێکی باشیدەبێت، ئەگەر بینی بچڕا کوڕەکەی دەمرێ، ئەمەش

لەکاتێکدا قـایش بەسـەر جلەکانیـەوە ببینـێ ئەگـەر لـەژێرەوە بەسـتبووی بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی ئاین‌و دنیا.

**ق ر**

**قرقێنـە:** (نابلـسی)دەڵێـت: قرقێنـە لەخەودا وتەو قسەی بێسوودو کەڵکە، دەگونجێت قرقێنـە بەڵگـەبێت لەسـەر دەوڵەمەندی بۆ هەژار.

**ق ژ**

**قژداهێنـەر(شـانەکار):** (نابلـسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە غەم‌و پـەژارە لەخەڵکی دووردەخاتەوە.

* ژنـی قژداهێنـەر ژنێکـی داپۆشـراوە، ئەوەی لێینزیکبێتەوە رێزو شکۆمەندی لای خەڵکی زیاددەکات.

* ئەگـەر قژداهێنـەر چـوە لای رەبـەنێك هاوسەردەگرێ.

* ئەگـەر قژداهێنـەر لـەحاڵ‌و بـارێکی باشـدابوو دەرەنجـامی رەبەنەکـە روو بەچاکەدەچێت.

* قژداهێنـەر ژنێکـی خـاوەن مـاڵ‌و داراییە.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر عەتارفرۆش‌و حـەمام، ئـەوەی قژداهێنـەرێك لەدەسـتبدات عـەتارێك یـان قژداهێنـەر یـاخود حـەمام لەدەسـتدەدات‌و قژداهێنەریش دایکی مرۆڤە.

**قژفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیاوێك دنیای زاڵبکات بەسەر ئایندا ئەگەر بەهاکەی بەدرهەم وەرگرت.

**قژلوولی:** (نابلسی)دەڵێت: لوولبوونی قژ لەخەودا بۆیەکێك سەری رووتاوەبێت بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتن‌و سەرهەڵدانی کارکردن بەسوونەت، ئەگەر لەخەودا قژێکی لوولی بۆ دروستبوو بەڵگەیە لەسەر قەرەبووکردن بەماڵ یان هاوسەر یاخود جل‌وبەرگ.

* چـرچ‌و لوولبـوونی جل‌وبـەرگیش بەڵگەیە لەسەر جوانی‌و رازاوەیی.

**قژەسـەر:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: قژەسەر ماڵ‌و دارایی‌و تەمەندرێژییە.

* قـژی پـڕ جیـاوازە بـەپێی خەوبنـەر، ئەگەر پیـاوێکی چاکەکاری بینـی قـژی زۆربوە پارێزگاری‌و هەیبەتە بۆ پیـاوە، ئەگـەر دەوڵەمەنـدێك بینـی مـاڵ‌و سـامانەکەیەتی، ئەگـەر هـەژارێك بینـی گوناهەکانیەتی.

* جوانی قژی سەر شەرەف‌و رێزدارییە، ئەگـەر بینـی قـژی لوولبـوە مـەزن‌و شکۆداردەبێ.

* ئەگەر قژە لولەکەی بینی درێژو بڵاوبوەتەوە ماڵو دارایی گەورەکەی پەرشو بڵاودەبێتەوە، ئەگەر نەرمو خاوبوو زیادبوونی ماڵو داراییە.

* هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی قژێکی درێژی هەیەو دڵخۆشە پێی باشە بەتایبەت بۆ ژنان چونکە ئەوان قژیان لەجوانکاریو خۆڕازاندنەوەدا بەکاردەهێنن.

* پرچ بۆ پیاو کوڕێکی پیرۆزە ، ئەگەر هاوسەرداربێ ، ئەگەر رەبەنبوو کچێکی جوانو شۆخ شەنگە ، هەروەها بۆ ژن کوڕی سەرۆکو فەرماندەو گەورەیەوبەڵگەیە لەسەر فەڕوپیتداری ئەوساڵە.

* بەڵام رەشی قژی ژن بەڵگەیە لەسە دووشت : یەکەم/ خۆشویستنی مێردەکەی بۆی. دووەم/ جێگیربوونی حاڵوباری مێردەکەی.

* ئەگەر ژنێك بینی قژی خۆی دەرخست مێردەکەی سەفەر دەکاتو بەجێی دەهێڵێ.

* ئەگەر بینی بەردەوام قژی دیارە مێردەکەی ناگەڕێتەوە بۆ لای ، ئەگەر مێرددارنەبوو هەرگیز شوو ناکات.

* ئەگەر قژی بەپری بینیو خەڵکی بەدییانکرد لەکارێکدا ئابڕووی دەچێت.

* ئەگەر پیاوێك بینی سەری بوە بەشاخ پیاوێکی پارێزراوە.

* ئەگەر قژی پێشەسەری بینی هەڵوەری ملکەچیو رسوای دێت بەسەریا لەوکاتەدا.

* ئەگەر قژی پاشەسەری بینی هەڵوەری بەڵگەیە لەسەر ناخۆشیەك لەکاتی پیریدا دێت بەسەریا.

* ئەگەر قژی لاجانی راستی هەڵوەری بەڵگەیە لەسەر پێکانی نێرینەیەکی خزمی، ئەگەر لای چەپیشبوو مێینەیە، ئەگەر خزمی نەبوو لەپیاوو ژن زیانە روو لەخۆیدەکات.

* تاشینی قژ بۆ پیاو لە(حەج)داو کورتکردنەوەی لەلێکدانەوەدا دڵنیاییو ئازادکردنو قەرزدانو دەروە بەپێی ئایەتی: ﴿لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُؤُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ﴾ (الفتح: ٢٧).

ئەگەر لە(حەج)دانەبوو هەر بەوچەشنەیە بەلام لە(حەج)دا بەهێزترە، ئەمەش ئەگەر خەوبینەر سەرۆك نەبوو بەلام ئەگەر سەرۆکبوو لەکاتی (حەج)دانەبوو قژبڕینی بەڵگەیە لەسەر هەژاری یان لابردنی یاخود شکانی نهێنیەکانی، ئەم خەونە بۆ

هـەژار قەرزدانەوەیـەو بـۆ دەوڵەمەنـد کەمو کورپیە روو لەماڵو داراییدەکات.

*ئەگـــەر خەوبینـــەر چـــاکەکاربوو دەستەڵاتو زەبرو زەنگـی لاوازدەبـێ، ئەگەر نەیبینی قـژی ببڕێ بـەڵام بینـی سـەری تاشـراوە زاڵـدەبێت بەسـەر دوژمنەکانیـــداو هێـــزو مـــەزنیو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت.

*هەندێکـــدەڵێن: قژتاشـــین کـــاتێ لەلێکدانەوەدا باشە بـۆ یـەکێك زوو زوو قژی بتاشێ.

*هـــەروەها دەڵـــێن: سەرتاشـــین بـــۆ جەنگاوەر شەهیدی دەهێنێت.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دەڵێت: بینیم قـژم تاشـراوەو لەدەمیـشمەوە باڵندەیـەك هاتەدەرەوە، ژنێکم تووشبوو خستمیە نێو عەورەتییەوە، هەروەها باوکم بینی دەگـەڕا بەدوامـدا ئنجـا لـێم ونبـوو، بـۆ هاوەڵـەکانی گێڕایـەوەو وتـی: خـۆم بـەمجۆرە لێکمداوەتـەوە: سەرتاشـینم دانانیـەتی، ئـەو باڵندەیـەش لـێم هاتـە دەرەوە روحمەو، ئەو ژنەی منی خستە نێـو عـەورەتی زەوییـەو تێـدا ونـدەبم، بەدومـــدا گـــەڕان لەلایـــەن باوکمـــەوە ئەوەیە هەمان حاڵو چارەنووسـی مـن روو لەباوکمدەکات. خاوەنی ئەم خەونە

شـــەهیدبوو بەوچەشـــنەبوو کـــەخۆی دیبووی‌و لێکیدایەوە.

*یـەکێکیتر بینـی سـەری دەتاشـێ بەدەستی خۆی بۆ راڤـەکارێکی خـەوی گێڕایـەوە ئـەویش وتـی: قـەرزەکـەت دەدەیتەوە.

*ئەگـەر ژنێـك بینـی قـژی تاشـراوە مێردەکـــەی تەڵاقیـــدەدات یـــاخود دەمرێت، ئەگەر بینـی مێردەکـەی قـژی دەتاشـــی یـــان قـــژی لـــەبنادەبڕێ لەحەرەمدا خەونەکەی بەڵگەیە لەسـەر دانـەوەی قەرزەکـەی یـاخود گەیانـدنی ئەمانەت.

*ئەگـــەر بینـــی مێردەکـــەی ســـەری لەشـــوێنێکی دی تاشـــی خەونەکـــەی بەڵگەیـــە لەســـەرنەوەی لەماڵەکەیـــدا بەندیدەکات.

*هەروەها دەڵێن: بڕینـی قـژی لەلایـەن مێردەکەیـــەوە بەڵگەیـــە لەســـەر ئابڕووبردنی.

*ئەگـەر بینـی مرۆڤێـك بانگیـدەکات بۆئـــەوەی قـــژی ببڕێـــت مێردەکـــەی بانگدەکات بۆ ژنانیتر بەنهێنیو لەنێوان خۆیو ئەوژنەدا ئاژاوە بەرپادەبێت.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر پرچی ژنەکەی بینی بڕابوو هەرگیز کوڕی نابێت.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵو تەمەندرێژییە، ئەگەر بینی قژی سەری درێژبوە تەمەنی درێژ دەبێ.

*ئەگەر تۆپەڵە قژێکی بەسەریەوە بینیو قژی دیکەی پێوەکرد ئەگەر دەوڵەمەندبوو ماڵو دارایی زیاددەکاتو ماڵو سامانیتر قەرزدەکاتو بازرگانی پێوەدەکات ، بەڵام ئەگەر هەژاربوو قەرزی لەسەر کۆدەبێتەوە.

*قژ ماڵو سامانە بۆ یەکێك هەیبێت یاخود بیگرێتە خۆی، لابردنی مووی سمێڵو بنباخەڵ بەڵگەیە لەسەر قەرزدانەوەو ڕەواندنەوەی غەمو پەژارەو شوێنکەوتنی سوننەت.

*هۆنینەوەی قژ بەڵگەیە لەسەر شارەزابوون لەکاروباردا.

*هۆنینەوەی قژ بەڵگەیە لەسەر شارەزابوون لەکاروباردا.

*هۆنینەوەی قژ بۆ ژنان بەڵگەیە لەسەر پاراستنی ماڵو کۆکردنەوەیو بۆکەسانی دیکە وەك هەژارو کوێر بەڵگەیە لەسەر ئاڵۆزبوونی کاروبارەکان.

*ئەگەر بینی قژی لەشوێنێکی تردا دەرهاتوە غەمو پەژارە ڕووی تێدەکات.

*قژتاشینو کۆکردنەوەی لەکاتی (حەج)دا بەڵگەیە لەسەر ئەمنو ئاسایشو تاشینو هەڵکێشانی ئەگەر ناشیرین نەبێت یان شێوەی تێکنەدات ڕەواندنەوەی غەمو پەژارەیە.

*هەروەها دەڵێن: هەڵکێشانی موو بەڵگەیە لەسەر قەرزدانەوە بەزۆر.

*ئەگەر سەربازێك بینی قژی درێژبوە چەكو جبەخانەی زیاددەکات.

*ئەگەر قژی خۆی وەك قژو یاڵی ئەسپ بینی دەستگیردەکرێ ئەگەر دزو گوناهباربێت.

*ئەگەر قژی خۆی بینی وەك هی بەرازی لێهاتبوو نارەحەتی ڕووی تێدەکات.

*زۆری قژ بۆ غەمبار زیادبوونی غەمو پەژارەیەو بۆ دڵشادو بەختەوەریش زیادبوونی خۆشحاڵییە.

*درێژی مووی بنباخەڵ پیاوێکە ئاینی ڕاستو دروستەو ڕێزدارو شکۆمەندە.

*ئەگەر بینی مووی بنباخەڵی درێژبوە پیاوێکە داواخوازی ماڵو سامانە لەزانیاریو بازرگانیو دەستەلاتداو ناگەڕێتەوە بۆ پیاوەتیو ئاین، ئەگەر

کیژ دابویە قژی‌و زۆربوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی منداڵی زۆرە.
*ئەگەر بینی قژی سەری درێژبوە زیاد لەئاستی خۆی ئەوەی حەزی لێدەکات ئومێدو هیواو ویستو خوازیەتی‌و دەوڵەمەند دەبێتو قەرزەکەی دەداتەوە منداڵەکانی تێردەکات.
*ئەگەر بینی درێژبوو لەناو جێی‌و لەنێوخەڵکیدا پێوەی رۆیشت قەرزیکی دێتەسەرو غەم‌و پەژارە دایدەگرێ‌و ناتوانێ بژێوی خانەوادەو ئەرکەکانی بەجێبکەیەنێت.
*هەروەها دەڵێن: درێژبوونی قژ درێژبوونەوەی بەدبەختییە ، یان زیادبوونی منداڵە ، هەروەها دەڵێن: فرەدەترسی‌و چاودێری خوایی لادروستدەبی‌و لەدنیادا غەمبارو دڵتەنگدەبێ.
*ئەگەر بینی قژی سەری کورتبوەتەوە لەوەی کەلەسەرییوە کەمبوونی غەم‌و پەژارەیە ئەگەر درێژییەکەی غەم‌و پەژارەبێت.
*ئەگەر بینی کەسێك قژی هەڵدەکێشێ بەلاو نەهامەتییەك‌و لەماڵ سامانیدەکەوێت.
*ئەگەر ژنێك بینی قژی برا بێئەوەی لە(حەج) بێت لەنێوان خۆی‌و مێردەکەی شەڕو ئاژاوە روودەدات، ئەگەر لەوکاتانەدابوو چاکییە لەئاین‌و دنیاو ئەسپەردەیا، ئەگەر مرۆڤێکی بینی قژی دەبڕێ لەدواوە بانگی مێردەکەی دەکات بۆ لای ژنانیتر بەنهێنی.
*ئەگەر بینی قژی بەرۆن چەورکرد جوانییە بۆی، ئەگە رۆنی لێچۆڕا غەم‌و پەژارە رووڵەکاروبارەکانیدەکات، ئەگەر بۆنێکی لێکرد پیاهەڵدانی باشە.
*ئەگەر بینی سەری دۆزی بۆ ئەسپێ دەکەوێت بەسەر هەندێك کەم‌و کوڕی خۆیدا.
*ئەگەر بینی قژی داهێناو ئەسپێی لێکەوتەخوارەوە ئەوە ماڵ‌و سامان لەمیراتیدا خەرجدەکات یان کەم‌و کوڕی بۆ دەردەکەوێ.
*ئەگەر بینی قژی سەری کەمیکردوە ماڵ‌و سامانەکەی تیادەچێت یاخود کەمێکی دەمێنێتەوە.
*ئەگەر بینی موو لەدەمووچاوی دێت یان لەشوێنێکدا کەمووی لێنایەت قەرز بەسەریا دەکەوێت.
*ئەگەر بینی قژی لەپشتی دەرهات سوودو قازانجدەکات.
*دەرهاتنی موو لەسنگ‌و زوبان داناییەو دەرخستنی شیعرو زیرەکییە

مەگەر لەسنووری خۆی دەربچێ ئەوجا دەگەڕێتەوە بۆ غەمو پەژارەو خۆخواردنەوە.
*ئەگەر مووی سکی زۆربوبوو قەرزەکانی زۆردەبن‌و غەم‌و پەژارە لەسەری کۆدەبێتەوە.
*ئەگەر بینی مووی باڵەکانی هەڵوەرین سەرجەم ئەو پارەیەی پەیدایکردوە بەفیڕۆ تیادەچێت.
*ئەگەر بینی مووی قاچەکانی زۆربوون‌و بایدەدا ماڵ‌و سامانێك بەدەستدەهێنێت بەپێچەوانەی کاری خەڵکی دەکات‌و با ترسی خوای لەدلا بێت.
*ئەگەر بینی قژی هەڵوەری سەرجەم هەوڵ‌وتەقەلاو رەنج‌و ماندوبوونی بەبادەچێت.
*بینینی ژن بۆ قژی خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دایدەپۆشێ.
*دەگونجێت قژ بەڵگەبێت لەسەر کشتوکاڵ‌و ماڵ‌و سامان‌و پلەوپایەو هاوەڵەو، بۆ ژن بەڵگەیە لەسەر مێردو بۆ پیاوی رەبەنیش هاوسەرە.
*رەشی‌و درێژی قژ بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵ‌وباری.
*کورتی‌و سپێتی‌و بۆگەنی بەڵگەیە لەسەر خراپی حاڵ‌وباری.

*ئەگەر قژی چەورکرد لەخەودا یاخود دایهێنا بەڵگەیە لەسەر چاکەو ئەمەکداری بەو پەیمانەی لەسەریەتی‌و تاشین‌و کورتکردنەوەی بەڵگەیە لەسەر ماڵ‌و سامان بەفیڕۆدان.
*کورتکردنەوەی بەڵگەیە لەسەر زانیاری‌و رێنومایی ئەگەر لەوادەی (حەج)دابێت، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر (حەج)، ئەگەر لوولیکرد بەڵگەیە لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ‌و سامان‌و کۆکردنەوەی کشتوکاڵ.
*ئەگەر قژیداهێنا یان کێچ‌و ئەسپێی لەسەریدەرهێنا بەڵگەیە لەسەر دەرکردنی خراپەکاران لەزەوی.
*ئەگەر قژی ژنەکەی داهێنا دەگونجێت تەلاقدانیبێت.
*درێژی قژ بۆیەکێك شایستەی نەبێت بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارەو بۆڵەو قەرز، درێژیشی بۆیەکێك شیاوو گونجاو نەبێت لەسەربازو مندالآن بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵ‌و باریان و زیادبوونی ماڵ‌و سامان‌و داپۆشینی حاڵ‌و باریان، ئەگەر درێژبوو بەپێچەوانەی سروشتی خۆیەوە بەڵگەیە لەسەر ناوبانگ‌و قەرزو غەم‌و پەژارە.

*دەگونجێت جوانی قژ بەڵگەبێت لەسەر:
+کرداری چاکە.
+شیعر نووسین.
+هەستکردن بەخێرو چاکە ئەگەر لەخەوەکەدا جوانبوو بەشەڕ ئەگەر ناشیرینو ناقۆڵابوو.
*ئەگەر لەخەودا ناشیرینبوو بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی لەرزین.
*ئەگەر قژی ژنەکەی هۆنییەوە بەسێ پرچ سێ بەسێ تەلاقدەدرێ، ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێت.
*ئەگەر قژێکی هەبوو دەگونجێ مارێك پەلاماری بدات یان بکەوێتەسەری.
*ئەگەر قژی مرۆڤ وەك قژی ئاژەڵەکانی لێهات بەڵگەیە لەسەر ماندوبوونو هیلاکی، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت.
*مووی ئەبرۆو برژانگو قۆڵو سنگو قاچ جوانییە بۆ پیاوو هەروەها هێزوماڵوسامانی هەمیشەییە.
*ئەو موانەی کەهیچ سوودێکیان نییە وەك مووی بنباخەڵو پێشی مرۆڤ زیادبوونی غەموپەژارەو دەرچوونە لەسوننەت.
*مووی گوێچکە زانیارییە یاخود قسەوگوتەیەکە گوێبیستی دەبێت.

*مووی لووت خێرێکە هەستی پێدەکات بەلام غەمو پەژارەو ناخۆشی تێدایە یاخود ماڵێکی شاراوەیە.
*موو بەلەشو لاری ئافرەتەوە پووچەڵکردنەوەی هاوسەرگیری رەبەنە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چاودێریکردنی خانەوادەکەی یان منداڵەکانی وەك پیاو.
*موو بۆ منداڵ بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی ، ئەگەر موەکە لەشوێنێکەوە دەرهات شیاوو گونجاو نەبوو وەك لەپیدەست یان بەری پێی پووچەڵکردنەوەی پشووە یاخود هەوڵدانە لەکارێکی بەدەر لەرەزامەندی خودا.
*دەرهاتنی موو لەلاشەی پیاوو دووگیانی ژنەکەیەتیو زیادبوونی موو بۆ کەسێکی بەلادار پتربوونی نەهامەتییەتیو کەوتنەخوارەوەی بەسەرچوونی بەلاو نەهامەتیەتی.
*زیادبوونی مووی لاشە بۆ کەسێکی خۆشحاڵ پتربوونی خۆشحاڵییو دەوڵەمەندییەتی.
*هەڵوەرینی موەکانیشی تیاچوونی دەوڵەمەندیەتی.
*ئەگەر مووی لەشو لاری بەسپێتی بینی ئەگەر دەوڵەمەندبوو زەرەردەکات

لەماڵەکەیداو ئەگەر هەژاربوو قەرزێکە دەتوانێ بیداتەوە.
* گۆڕانی مووی لاشەی ئاژەڵو دڕندە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەکەوێتە نێو نارەحەتییەوە.
* زۆربـــوونی مـــووی ســـنگی قەرزابوونیەتی.
* ئەگـەر بینـی قـژی خـۆی دەبڕێـت لەپلەوپایەی دێتەخوارەوە.
* ئەگـــەر ژنێـــك قـــژی تیـــشكو ڕووناکیدەدایـەوە دەوڵەمەندبوونیـەتی بەماڵی مێردەکەی.
* ئەگەر لەلاجانەکانیەوە قژێکی جوانی بینـی پیـاوێکی سینەسـافە، ئەگـەر وانەبوو پیاوێکی پیسو گەندەڵە.
* ئەگـەر بینـی مـووی ئەسـپی پێوەیـە بەڵگەیـە لەسـەر بەندایـەتیو هیلاکـیو ماندوبوونی.

**قژهۆنینـەوە:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: هۆنینەوەی قژ بۆ ژن باشە لەگـەڵ ئـەو پیاوانـەی ڕاهـاتوون لەسـەریو بـۆ خەڵکیتر خراپە.
(نابلـسی) دەڵێـت: هۆنینـەوەی قـژ بـۆ سـەرجەم خـەڵکی بەڵگەیـە لەسـەر ئـاڵۆزی کاروبـارو قـەرزێکی زۆر، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شڵەقانو ئاڵۆزی.

**قـژی دەسـتکرد:** (نابلـسی) دەڵێـت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کارێکی پووچو بەتاڵ.
* هەروەها قـژی دەسـتکرد ژنێکـە هـیچ خێرێکـی تێـدا نییـە نەلـەئاین یـاخود لەحاڵو باریدا.

## ق س

**قسە(گوفتارـ وتـە):** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: قـسەووتەی مـردوو لەگـەڵ دەنگـی باڵنـدە بـۆ خەوبینـەر مژدەیـە بەبەدەستهێنانی دەستەڵاتێکی مـەزنو زانیاریو فیقە.
* دوانـــدن بـــەزوبانی جۆراوجـــۆر بەدەســـتهێنانی مـــوڵکێکی مـــەزنو گەورەیە.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر حوشترو مـەڕو یەکێك لەئاژەڵانی بینی دەدوێت لەگەڵی بـەلام بـیری نەکەوتـەوەو نەیگێڕایـەوە تووشی شەڕو دەنگـەدەنگو تیاچوونی خۆیو موڵكو دەستەڵاتدەبێ.
* ئەگەر پڵنگێکی بینیو وتی: خەونێکم بینـــی مـــژدەی بەدەســـتهێنانی دەسـتکەوتە یـاخود سـوودو قـازانجو خۆشحاڵییە.
* قـسەو وتـەی باڵنـدە خێروچـاکەیە، ئەگەر بینی باڵندەیەك دەدوێ لەگـەڵی پلەوپایەی بەرز دەبێتەوە.

*ئەگەر مارێکی بینی بەزوبانێکی ناسك دوا لەگەڵی خێرو خۆشی پێدەگات لەلایەن دوژمنێکەوەو خەڵکی پێی سەرسامدەبن.

*ئەگەر بینی ئاژەڵێك دەدوێت لەگەڵی ئەوە دەمرێ بەپێی ئایەتی: ﴿ وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ ﴾ (النمل:٨٢).

*ئەگەر بینی سەری یا لووتی هاتەگۆ ئەو ئەندامەی بەلاو نەهامەتیەك رووی تێدەکات یاخود هەژار دەکەوێ.

*ئەگەر دارێك دوا لەگەڵی یاخود پێکهاتەو شتێك گونجاوبوو لەگەڵ خەوبینەر بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی ئەوشتەو خەڵکی پێی سەرسامدەبن.

*وتەو قسەی منداڵ لەخەودا هەرجۆرێك بێت حەق و راستییە.

*دەگونجێت گوێبیستبوونی قسەی منداڵ بەڵگەبێت لەسەر کەوتنەنێوکاری یاساغەوە.

*ئەگەر خەوبینەر لەچاکەکارانبێت خەڵکی دەکەوێ بەسەر رێکەوتنی سەیردا یاخود دەکەوێت بەسەر رووداوێکی سەیردا یان لەکەسێکی دەبینێ.

*هاتنەگۆی بێگیان ئاشتەوایی و رێکەوتن یان ئامۆژگارییە.

*قسەو وتەی ئاژەڵ دەگونجێت سزاو خەشمبێت.

*قسەو وتەی دارو درەخت بەرزی پلەوپایەیەو وتەی مردوان فیتنەو ئاشوبە.

*قسەو وتەی ئەندامەکان نارەزاییە لەخەڵکییەوەو گوناهو تاوان ئەنجامدانە.

*قسەو وتە لەسەر زوبانی کەسەکان و هەڵپەراندنیان بەڵگەیە لەسەر ئامادەکردنی جنۆکە، قسەو وتەی لەسەر زوبانیان فیتنەو ئاشووبە.

*قسەو وتە لەهەموو شتێکەوە ئەگەر هاوتای قورئان و سوننەتبوو یان عەقڵ و ژیری خێرە لەبیستنیدا ، ئەگەر واژووی قورئان و سوننەتبوو کارێکی یاساغەو دەبێت ئاگاداربێ، ئەگەر ئەندامێکی لێی هاتەگۆ ئامۆژگارییە دەبێت لەکەسەکانی وەربگرێ یان لەشەریك و خزمی نزیکی چونکە ئەوان شاهیدن بەسەریەوە لەرۆژی قیامەتدا لەلای خودا لەسەر ئەوکارەی کەپێی ئەنجامداون.

*قسەو وتەی ئاژەڵ بەڵگەیە لەسەر ملکەچی و خوازیاری هاوەڵان و

دڵخۆشبوونی بەگوێرایەڵیو بژێویو پارە پەیداکردن.
* قسەو وتەی دوو یارو دڵدار ئاگادارییە بەجیابوونەوەو تامو چێژ وەرگرتن لەشوێنەوار.
* قسەو وتەی دارودرەخت بەڵگەیە لەسەر ئاژاوە.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەرزی پلەوپایەی خەوبینەر چونکە لەموعجیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وسەلامەتی رێبازو رێنومایيەتی بەپێی گوتاری خوداوەند بۆ (موسا) (سەلامی خوای لێبێت) لەنزیك دارێك.
* قسەو وتەی دوژمن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەسەرچوونی ماوەی دەنگ لەیەکدابڕان.
* ئەگەر گوێی لەدەنگیبوو فەرمانی پێدەداو رێگری لێدەکات بەمژدە لێکدانەوەی نییەو وەك خۆی وایە.
* وتاری خوداوەند بۆ بەندەکانی لەرۆژی دواییدا تایبەتەو بەڵگەیە لەسەر:
+بەرزی پلەوپایەو نزیکی لەفەرمانڕەوایان.
+کرداری چاك.
+باشی ناوبانگ.

* وتاری خودا لەقیامەتدا بۆ بەندەکانی بۆ ساڵێك بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی دادپەروەریی.
* ئەگەر خەوبینەر لەخێرپارێزەرانبوو پشت لەدنیادەکاتو روو لەقیامەت.

## ق ف

**قفڵ:** (نابلسی) دەڵێت: پیاوێکی ئەمانەتدارە، هەروەها دەڵێن: کچێکە بۆیەکێك چارەسەری بکات.
* ئەگەر بینی قفڵێك دەکاتەوە لەزیندان قوتاردەبیٚ.
* ئەگەر غەمبارێك قفڵێکی کردەوە غەمو پەژارەی دەڕەوێتەوەو کاروبارەکانی ئاساندەبن.
* قفڵ توێشوو بەڵگەو هێزە.
* ئەگەر بینی قفڵێك دەکاتەوە باوریابێت لەسوێندێك کەدەیخواتو لەهاوسەرەکەی جیادەبێتەوە، ئەگەر قفڵەکەکرایەوە لەیەکدی جیادەبنەوە.
* قفڵ مرۆڤێکە پشتی پێدەبەستریٚ لەئەمانەت پارێزیدا.
* ئەگەر بینی دەرگایەکی داخست دادەخرت بەڵێندەرو کەفیلێك لەپیاوێك وەردەگریٚ یان بەڵێندەرو کەفیلی لێوەردەگیریٚ.

*ئەگەر بینی قفڵێك دەكاتەوە لەغەمو پەژارە قوتاردەبیٚو لەژێربارو حاڵێك دەردەچێت.

*هەموو داخستنێك غەمو پەژارەیە، هەموو كردنەوەیەك دەروە.

*قفڵ بۆ یەكێك هاسەرگیری ئەنجامبدات بەڵگەیە لەسەر ئەنجامدانی كاروبارەكانو گەیشتن پێی.

*بۆیەكێك بیەوێت خزمەتكارێك بگریٚ بەڵگەیە لەسەر هەماهەنگبوون لەسەری، بۆیەكێكیش بیەوێت سەفەربكات سەلامەتیو چاودێرییە.

*زنجیرە ئاسنینەكان بەڵگەیە لەسەر كردنەوەی هێماو نیشانەكانو زانیاری.

*قفڵەكانی دار هاوسەرە، سەرجەم ئەوانەش بەڵگەیە لەسەر هاوسەر، هەروەها بەڵگەیە لەسەر هاسەرگیریو منداڵو زانیاریو داناییو ئاسانبوونی كاروبارەكان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پاراستنی پەیمانو بەڵێن.

*هەروەها قفڵ بەڵگەیە لەسەر بێئاگایی خوداوەند دەفەرموێت: ﴿ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا ﴾ (محمد: ٢٤).

*قفڵ كەفیلێكی دەستەبەركارە.

*قفڵە ئاسنینەكان بەڵگەیە لەسەر چاكسازی ئەوەی بەڵگەیە لەسەریو لەسەر ئاسنێكی پتەو.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شكۆمەندیو بەرزیو بڵندی ئەگەر لەشوێنی قفڵەدارینەكانبوو.

*هەروەها قفڵی دارین بەڵگەیە لەسەر دووروویی لەوتەو وەرگرتنی بەرتیلدا.

**قفلساز:**(ئیبن سیرین) دەڵێت:

پیاوێكی دەلاڵە، ئەگەر بینی دەرگای فرۆشگاكەی داخست دەلاڵدەبیٚ.

*ئەگەر بینی دەرگای ماڵێكی داخست دەلاڵی هاوسەرگیرییە.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر شاردنەوەی نهێنیو هاوسەرگیری بۆ رەبەن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+پەرچدانەوەی دووروان.

+ئاسانبوونی كاروباری قورسوگران.

**ق ن**

**قنگ ( پاش ):**(ئیبن سیرین) دەڵێت:

ئەگەر بینی لەقنگیەوە تاڵێك هاتە دەرەوە كیژێكی شۆخو شەنگو جوانیدەبێت.

*ئەگەر ماسیەك هاتە دەرەوە كچێكی ناشرینی دەبێت.

*ئەگەر كرمێك هاتەدەرەوە یا كێچو لەهەموو حاڵو بارێكدا غەریبن بەپێی پیاهەڵدانو باسكردنی خۆی.

*ئەگەر خوێنی لێهاتە دەرەوە دەرچوونیەتی لەگوناهو تاوان، ئەگەر پیسبوو ماڵو دارایی حەرامی لێدێتە دەرەوە.

*هەروەها دەڵێن: هاتنەدەرەوەی خوێن لەپاشی مرۆڤ كوڕەزایە بۆ خەوبینەر.

(نابلسی) دەڵێت: قنگی مرۆڤ لەخەودا بەمێردو ماڵ لێكدەدرێتەوە ئەگەر بینی قنگی گیراوە دەمرێت.

*دەرچەو پاشی مرۆڤ پیاوێكی رسواو ملكەچە، وتراویشە پیاوێكی تەپڵ ژنە یاخود پیاوێكە نهێنی دەپارێزێ.

*ئەگەر پاشی پیاوێكی بینی لەدواوە زەفەری پێدەبات گەرلاوبێت، ئەگەر بەتەمەنو ناسراوبێت بەپشتا دەیخات.

*ئەگەر قنگی ببرێت سۆزو رەحمی دەبچرێت.

*ئەگەر پاشی دایكی ببینێ (حەج)ەكەی بەتاڵدەبێتەوە ئەگەر سووربێت لەسەری، وەگەرنا بژێویو رزقو رۆزی دەوەستێ.

*ئەگەر پاشی مرۆڤێك ببینێ رووخسارێكی گرژومۆندەبینێ.

*ئەو خوێنو پیساییەی لێی دەردەچێت ماڵو داراییە بەو ئەندازەیە، ئەگەر پیسایی لێهاتە دەرەوە ماڵو سامانێكی لێدەردەچێت لەبوارو بەرژەوەندیەكا.

*هاتنە دەرەوەی پیسایی لەدەرچەیەكیترەوە دەركردنی ماڵو سامانە لەكارێكی بێسوودا.

*هەروەها دەڵێن: پاشو دواوە پیاوێكی نەزانە.

*پاشی ژنێكی نەناسراوو نادیار پشتتێكردنی دنیاو ئاوابوونیەتی.

*ئەگەر لەورگ یان پاشی پارچە پەڕۆیەك بێتە دەرەوە لەگەڵو كۆمەڵێكی غەریب جیادەبێتەوە، یان لەنانێك دەخۆن هی مندالەكانیەتی.

*ئەگەر بینی مارەیی ژنێكدەبڕێت لەسەر پاشیو داوای شتێكدەكات لەسەرباری خۆی نییە بەدەستەواژەیەكی دی سوودی لێوەر دەگرێت.

*ئەگەر بینی بەدواوەی رادەكێشرێ ناچار دەبێت.

*چنگ كیسەی پیاوە یاخود سندووقو گەنجینەو بازرگانیو سەرمایەو كۆڕو كۆبوونەوەیە، ئەگەر بینی شتێكدیت

بەسەریا رووداوێکە دێت بەسەر یەکێك لەوانەی باسمانکرد.

* دەگونجێت قنگ لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی لەکاتی بەئاگاییو بێداریدا لەسەری دادەنیشیٚ لەزینی ئاژەڵو حەسیرو...

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رووتێکردنی بۆ کاروباری مەزنو پشتتێهەڵکردنی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەروازەی نهێنی یاخود خزمەتکارو بەردەستی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+ئاگردانی ئاسنگەرو فووتێکەری فووان.

+قسەی چاکو خراپ.

+زێراب کەپیسو پۆخڵی خەڵکی پێدا تێدەپەرێت.

+ماڵو لانەیەك کەس رووی تێناکات.

+سەختەزەوی کەهیچ کەسێك نایکات بەکشتوکاڵو بەرهەمی تێدا نادوورێنەوە.

+پیاوێکی شەرەنگێز خۆی لێبەدوور دەگریٚ.

+شوێنی بیدعەو کاری خراپە.

+ئاهەنگو شادی.

* ئەگەر زیادەیەك لەپاشی دەرهاتو خراپبوو بەڵگەیە لەسەر پشتهەڵکردنی لەرۆژی جەنگو پێکدادانـدا یان ئەو رابەرەی دەریبرِیوە لێی پاشگەز دەبێتەوە.

* دەگونجێت بکەوێتە هەڵوێستێکەوەو نەیەوێت لێی قوتار ببێت، یاخود رێگەیەك بدۆزێتەوەو بەرژەوەندی لەوەدابێت، دەگونجێت دابنیشێتو سەفەر نەکات.

## ق ل

**قلیشبوونی زەوی:** (نابلسی)دەڵێت: قلیشبوونی زەویو هاتنەدەرەوە روەك لەباخچەکاندا بەڵگەیە لەسەر دووکیانبوونی هاوسەرەکەیو راچڵەکانی بەتەلاقدان، خوداوەند دەفەرمویٚ: ﴿فَاذَا أَنْزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنْبَتَتْ مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ (الحج: ٥).

## ق و

**قوتابخانە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر مامۆستاو زانایان ئەو مەزهەبەی زانیاری لێوەردەگریٚ.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تەلاقو گەراندنەوەی.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر چاکەو بەجێهێنانی سنوورەکانو مامەڵەو فرۆشتنو کرِینو ئاژاوە هەڵگیرسانو فیتنە.

**قوتـاربوون ( پـاكيزەيىو پـاكيّتى ):** ئـەوەى ببينـىّ لەخـەودا پـاكيزەيىو قوتـاربوونى پيّدەبەخـشريّت دلّنيـا دەبيّت لەوەى ليّيدەترسيّت.

**قوتـاربوون لەنارەحـەتى:** (نابلـسى) دەلّيّـت: بەلّگەيـە لەسـەر دەرەنجامى كارى باش وەك رۆژوو خيّر.

**قوچكەكانى ميسرو پيّكهاتـەى تـر :** بينينى لەخەودا بەلّگەيە لەسەر هەوالّو سەرگوزشـتـەى سەرسـوڕهيّنەر لەنەتـەوەكانى پيّـشوو، يـاخود ئامۆژگارىو بيروبۆچوون.

*دەگوتجيّت بينينى بەلّگەبيّت لەسـەر هاوسـەرگيرى رەبـەن لەگـەلّ موشـريك يـان عەجەميـدا يـاخود تيّكـەلّبوونو هەلّگرتنى مەزهـەبى بيدعەچيەكان، يا گرنگيدان بەهونەرو زانست.

*دەگوتجيّت بينينى بەلّگەبيّت لەسـەر تەمەندريّژى يان شـويّنى گالّتـەو گـەپو سـەماو ئـارەقو...يـان ديّـرو چـنينو خومكردنى جلو بەرگ.

**قورئـان( مـصحف ):** (ئـيبن سـيرين) دەلّيّت: ئەگەربينى لەقورئانيّكدا قورئان دەخـويّنىّ دانـايىو شـكۆمەندى بەدەستدەهيّنىّ لەليّكدانەوەدا.

*ئەگـەربينى قورئـانيّكى كـڕى زانيارييەكـەى لەئاينـدا لـەنيّو خەلّكيدابلاّودەبيّتـەوەو خيّـرو سـوودى زۆر دەگەيەنىّ.

*ئەگەربينى قورئانيّك دەفرۆشىّ خـۆى لەخراپە دەپاريّزىّ.

*ئەگەر قورئانيّكى سـووتاند ئاينەكـەى تيّكدەدات.

*ئەگـەر قورئـانيّكى دزى نويّـژى لەبيردەچيّتەوە.

*ئەگـەر كتيّبيّـك يـان قورئـانيّكى بەدەسـتيەوە بينـىو كـاتىّ كرديـەوە نووسـينى تيّدانـەبوو بەلّگەيـە لەسـەرئەوەى نـاخو دەروونـى واژووى هەلّسوكەوتى ديارو بەرچاويەتى.

*ئەگـەربينى لاپـەڕەكانى قورئـانى خـوارد قورئـان بـەپارە دەنووسيّتو رزقو رۆزى لەلايـەكى ديكـەوە داوادەكات.

*ئەگـەربينى ماچـى قورئـانيكرد كەمتەرخـەمى نانويّنيّـت لەبـەجيّهيّنانى ئەركەكاندا.

*ئەگـەربينى قورئـان دەنوسـيّتەوە لەسـەر دەفـو گلّيّنـەدا راوبۆچـوونى خۆى لەقورئاندا دەردەبڕىّ، خۆئەگـەر لەسەر زەوى نووسى بيّباوەڕە.

*دەگيّڕنـەوە (حەسـەن)ى (بەسـرى) (رەزاى خـواى ليّبيّـت) لەخـەودا بينـى قورئـان لەجلوبەرگـدا دەنووسـيّتەوە، خەوەكەى گيّڕايەوە بۆ (ئـيبن سـيرين)

ئـەویش وتـی: لەخوابترسـە قورئـان بەراوبۆچـوونی خـۆت لێـك مـەدەرەوە خەونەکەت بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخـەودا بەپادشـاو دادوەری موسـوڵمانان لێکدەدرێتـەوە ئەوانـەی لـەکاروباری ئاینـدا پـشتیان پێدەبەسترێ.

* ئەگـەربینی قورئانێـك لـەناوبرا یـا سووتا یاخود شۆرا ئەگەر فـەرمانڕەوا یان دادوەربوو دەمرێ.

* ئەگــەر دەســتەلاَتدارێکی بینــی قورئانێــك دەنووســێ دادپــەروەری دەردەخـاتو پـشتگیری سـەرکەوتنی شەرعدەکات.

* ئەگـەر دادوەرێـك بینـی قورئانێـك دەنووســـێ رژدو بەخێلـــدەبێت لەزانیاریو پلەوپایەدا.

* ئەگــەر زانایــەك بینــی خــەریکی نووسینی قورئانێکـە لەبازرگانیەکەیـدا سوودمەند دەبێت.

* ئەگـەر فەرمانڕەوایـەك بینـی یـاخود کەسـێك خـەوی پێـوەبینی قورئانێـك بەدەستدەهێنێ دەمرێ.

* ئەگــەر دادوەرێــك قورئــانێکی بەدەستهێنا لەوڵاتی خـۆی دەردەچـێ، ئەگـەر بـەزوبان قورئـانێکی سـڕیەوە گوناهێکی گەورە ئەنجامدەدات، ئەگـەر گەواهیــدەرێك ســڕیەوە پاشــگەز دەبێتەوە لەگەواهیدانەکەی.

* ئەگەر قورئـانێکی هـەڵگرت یـان کـڕی بەحکومەکانی کاردەکات.

* ئەگـەر بینـی قورئـان بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ)دەخوێنێتەوە لەبەریدەکات.

* لاپەڕەکانی قورئان لەلایـەن پیـاوێکی سـادەو گـشتییەوە مـسۆگەرکردنی بژێوییە بەسەر قورئانەوە.

* ئەگــەر بینــی قورئــان بەدەســتی دەنووســێ ئـاینو زانیـاریو کـردار کۆدەکاتــەو پاشــان دووڕوو دەبێــت لەگەڵ خەڵکیدا.

* ئەگـەر قورئـانێکی دڕانـد بەدەسـتی پیاوێکە نکوولیدەکات لەوەی خوداوەند دایبەزانـدوە یـان رەخنـە لەئایـەتێك دەگرێ.

* ئەگـەربینی کارێـك ئەنجامـدەدات لەقورئانـدا رقـی لێدەبێتـەوە لـەکاتی بێداریـدا بەڵگەیـە لەسـەر تێکـچوونی ئایینەکەی.

* ئەگەر قورئانێکی بەدەستی خۆیەوە بینـــی دەســـتەلاَتو زانیـــاری بەدەستدەهێنێ.

* قورئــان هاوســەر یــان کــوڕو مــاڵو سامانە، ئەگەر خەوبینەر نەخۆشێکی هەبوو چاکدەبێتەوە، دەگونجێت سـەر بکـەوێت بەسـەر دوژمنەکانیـدا، ئەگـەر

سەرپێچیکاربوو تەوبەدەکاتو دەگەڕێتەوە بۆلای خودا یان ماڵو میراتی بۆ دەمێنێتەوە ، ئەگەر خەوبینەر لەسەر بیدعەبوو خوداوەند بەقورئانی پیرۆز ئاگاداریدەکاتەوە.

*دەگونجێت بینینی قورئان بەڵگەبێت لەسەر هەواڵی سەیرو دڵخۆشکەرو تەمەندرێژی بۆ یەکێك هەموو لاپەڕەکانی هەڵبداتەوە.

*دەگونجێت قورئان بەڵگەبێت لەسەر:

+باخچە.

+روح.

+بەهەشت.

+شوێنی بەندایەتی.

+ئەوەی دەبێت گوێڕایەڵی خۆی بنوێنێ.

+سوێندی راستو دروست.

+مژدەو هەواڵی خۆش.

+ئاگاداریی.

+بۆیەکێك شایستەی دەستەلاتبێ بەدەستیدەهێنێ.

*ئەگەر کتێبێك یان قورئانێکی بەدەستیەوە بینی بەلام کاتێ ئاوەلایکرد وانەبوو خۆی بەچەشنێ دەنوێنێ وانییە.

*ئەگەربینی لاپەڕەکانی قورئان دەخوات قورئان بەپارە دەنووسێتەوە.

*ئەگەر تەماشای قورئانیکردو دێڕەکانی بەخواری بینی ئەوەی هەیەتی ئەنجامیدەدات.

*ئەگەربینی تەماشای قورئاندەکاتو لەجلوبەرگدا دەنووسێ قورئان بەڕاوبۆچوونی خۆی لێکدەداتەوە.

*ئەگەر لەژوورەکەی خۆیدا قورئانێکی بینی بەلام باڕۆکەیەك هاتو کتێبەکەی برد کوڕێکی دەبێت قورئان دەخوێنێتەوە.

*قورئان میراتیو ئەمانەتە لەگەڵ رزقو رۆزی حەلاڵو هێزو توانا.

*ئەگەربینی قورئانەکەی لێبڕا زانیاری لێدەبڕێتو کردارەکانی لەدنیادا دەپچڕن.

*ئەگەربینی لاپەڕەکانی قورئان بلاودەکاتەوە خوازیاری دانایی یا میرات دەبێ.

*ئەگەربینی قورئانێك هەڵدەگرێ دەستەلاتێك بەدستدەهێنێو دەبێت بەهەلگرانی قورئانی پیرۆز.

*ئەگەربینی لاپەڕەکانی قورئانێك دەخوات زۆر قورئان دەخوێنێتەوە، بەلام ئەگەر بینی دەیەوێت بیخوات بەلام ناتوانێ هەولدەدات لەبەرکردنی قورئان چارەسەر بکات بەلام ناتوانێو زاڵنابێت بەسەریا.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی قورئانی دەخوێندو خۆی یەکلایدەکردەوە ئارەزوومەندە.

*ئەگەر بینی قورئانی دەخوێند نانی پێوە دەخوات.

*ئەگەر بینی قورئانێکی خستوەتە ژێرسەری پیاوێکە حوکمو بڕیارەکانی نێو قورئان جێبەجێ ناکات بەپێی فەرموودەی: "ولا توسدوا بالقران "[1].

*ئەگەر بینی قورئانی لەبەرکرد بەڵام نەیپاراست موڵکو دەستەڵات بەدەستدەهێنێ بەپێی ئایەتی: ﴿ انی حفیظ علیم ﴾ (یوسف:٥٥).

*ئەگەر بینی گوێبیستی قورئان بوە دەستەڵاتی زیاددەکاتو دەرەنجامیشی باشدەبێت.

*ئەگەر بینی قورئانەکەیان لێسەند زانیارییەکەی لێوەردەگیرێو کردارەکانی لەدنیادا کۆتایی دێت.

*ئەگەر بینی قورئانی بەسەرا دەخوێنرێتەوە بەڵام لێی تێناکات خراپەیەك رووی تێدەکات یا لەلایەن پەروەردگارەوە یان لەلایەن دەستەڵاتدارێکەوە بەپێی ئایەتی:

﴿وقالوا لو كنا نسمع أو نعقل ماكنا في أصحاب السعير ﴾ (الملك: ١٠).

*ئەگەر ئایەتی سۆزو بەزەیی دیو گەیشت بەئایەتی سزاو قورسوگرانبوو لەسەری خوێندنەوەی دەرووی لێدەکرێتەوە.

*ئەگەر بینی ئایەتی سزا دەخوێنێتەوەو کاتێ گەیشت بەئایەتی سۆزو بەزەیی بۆی نەسازا خوێندنەوەی هەر لەناڕەحەتیدا دەمێنێتەوە.

*ئەگەر بینی قورئان دەخوێنێتەوە داواخوازی بەدەستدەهێنێو خێری زۆردەبێت.

*دەگێڕنەوە پیاوێکی قورئانخوێن لەخەودا بینی پەڕە پەڕەی قورئان دەدڕێنێو دەیخاتە نێو ئاگرەوەو گڕوبڵێسەکەی دادەمرکێتەوە، ئەم خەوەی بۆ یەکێك لەراڤەکارانی خەو گێڕایەوەو ئەویش وتی:فیتنەو ئاشووب لەلایەن دەستەڵاتدارەوە بەرپادەبێو بەخوێندنی قورئان ئەو فتنەیە دادەمرکێتەوە.

*ئەگەر گوێی لەقورئانبوو دەخوێنرایەوە دەستەڵاتی پتەودەبێو دەرەنجامی باشدەبێو پەنادەگرێ بەخوا لەپلانو ناپاکی خراپەکاران، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ واذا قرأت القرآن جعلنا بينك وبين الذين لا

[1] (بوخاری) لە (التاریخ الكبیر) (٨٤/٦) لە(عبیدە)ی (مەککی)یەوە..

يؤمنون بالآخرة حجابا مستورا ﴾ (الإسراء:٤٥).
(نابلسی) دەڵێت: خوێندنی قورئان لەخەودا لەسەر قورئانەکە فەرمانو ڕێگریو ڕێزو خۆشحاڵیو سەرکەوتنە.
*ئەگەر یەکێك لەبەر قورئانی خوێندەوە لەخەودا لەپێناوی حەقدا بەربەرەکانێدەکات هەتا ئەو ئەمانەتەی لەئەستۆیدایە بەجێیدەگەیەنێو باوەڕدارێکی ملکەچ دەبێو فەرمان بەچاکەدەکاتو ڕێگری لەخراپە.
*ئەگەر بینی پەتێکی لەقورئان پێدرا یاخود بەشێکی بەدەستەوەبوو با لەنەفسی خۆیدا بپارێزێ ئەو ئایەتو پیتانەی قورئان ، ئەگەر ئەو ئایەتە باسی لەمژدەو سۆزو بەزەیی دەکرد لێکدانەوەی سۆزو بەزەییو مژدەیە، ئەگەر سەبارەت بەئامۆژگارییبوو ئامۆژگارییەکە پەروەردگار سوودمەندیدەکات ئەگەر کاری پێبکات، ئەگەر تۆڵەو هەڕەشەبوو یاخود سزاو خەشمو قینبوو ئاگادارییە بەسزایەك بەهۆی سەرپێچییەکەوە ڕووی تێکردوە.
*ئەگەر سەبارەت بەفەرموودە یان نموونەیەکبوو دەربارەی نەتەوەکانی پێشوو ئامۆژگارییە بۆی.

*ئەگەر بینی قورئانی بەسەرا دەخوێندرێتەوە یاخود خێرودانایی فێردەکەن بەڵام وەرینەگری سزایە لەلایەن دەستەڵاتدار یان سزاو خەشمی خواییەوە.
*ئەگەر بینی هەموو قورئان دەخوێنێتەوە تا کۆتایی لەلایخوداوە پاداشتێکی گەورەی هەیەو دەگات بەخواستو هیوای خۆی.
*ئەگەر نەخوێندەوارێکی بینی قورئان دەخوێنێتەوەو دەمرێ.
*ئەگەر جوولەکەیەکی بینی قورئان دەخوێنێتەوە قورئان لەدنیادا ئامۆژگارییەو ئایەتی سزاش لەدنیادا هەر سزایە.
*هێنانەوەی نموونەو پەندەکانی هەمان پەندی دنیایە، ئایەتەکانی سزای دنیا هەمان سزایە، ئایەتی نازو نیعمەتیش هەر نازو نیعمەتی دنیایە.
*خوێندنەوەی دنیا بۆ بێباوەڕ باوەڕهێنانە بەڵام ئایەتەکانی سزاو سۆزو بەزەیی لێکدەدرێتەوە بەمامەڵەی بەرپرسەکەی بۆی.
*ئەگەر بینی قورئان لەشووشەدا دەنووسێ یان سەدەف بەراوبۆچوونی خۆی لێکیدەداتەوە.

*ئەگەر بینی قورئان لەسەر زەوی دەنووسێ بێباوەڕە.

*هەروەها دەڵێن: قورئانخوێندن بەجێهێنانی پێداویستیو پاکی حاڵوبارە.

*ئەگەر کۆمەڵێکی بینی لێبڕاون قورئاندەخوێنن ئەوانە حەزو ئارەزوودارنو بۆئەو کارە لێبڕاون.

*ئەگەر بینی ئایەتێك لەقورئان دەخوێنێتەوە نازانێ یان دەزانێ لەکوێدایە ئەگەر نەخۆش بێت چاکدەبێتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿وشفاء لما في الصدور﴾ (یونس:٥٧).

*ئەگەر بینی قورئان بەزوبان دەلێسێتەوە گوناهێکی گەورەی ئەنجامداوە.

*خوێندنەوەی قورئان بەڵگەیە لەسەر کاری چاکەو بەرزبوونەوەی پلەوپایە.

**قورئانخوێن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر قورئانخوێنەکانی بینی لەیەك جێگەدا کۆبوونەتەوە لەوشوێنەدا پیاوەکانی فەرمانڕەوای بالاّ کۆدەبنەوە.

(نابلسی) دەڵێت: قورئانخوێندن لەسەر گۆڕ بەڵگەیە لەسەر ئامۆژگاری یەکێك قبوڵی ناکاتو فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە ناکات.

*قورئانخوێنی جەنازە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ڕووپامایی لەکردارەکاندا.

*قورئان خوێن لەکتێبدا بەڵگەیە لەسەر گومانو نەخۆشی یان خۆشەویستی بۆ یەکێك کتێبەکە بەڵگەبێت لەسەری.

**قوربانی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت:قوربانی مژدەیە بەقوتاربوون لەگشت غەمو پەژارەیەكو دەرکەوتنی فەڕو پیت بەپێی فەرمایشتی پەروەردگار: ﴿وبشرناه باسحاق نبيا من الصالحين(١١٢) وباركنا عليه وعلى اسحاق﴾(الصافات).

*ئەگەر خەوبین ژنێکی دوگیان بوو کوڕێکی ساڵحو باشیدەبێت.

*ئەوەی بینی حوشترو مانگا یاخود بەرانێکدەکات بەقوربانی لەئازادکردنی کەسانی زیندانیدا ڕۆڵێکی کاریگەریدەبێت.

*ئەگەر قەرزار ببینێ قوربانیدەکات قەرزەکەی دەداتەوە یان دەوڵەمەند دەبێت یاخود دڵنیا دەبێتو ترسی دەڕەوێتەوە، یاخود ژن ناهێنێتو (حەج)دەکات، یان جەنگاوەرێکەو سەر دەکەوێت، یاخود غەمو پەژارەی هەیەو دەڕەوێتەوە.

*ئەوەی ببینێ گۆشتی قوربانیەکەی دەبەخشێتەوە لەغەمو پەژارەکانی قوتار دەبێت و رێزو پلەوپایە بەدەستدەهێنێت.

*ئەوەی ببینێ گۆشتی قوربانی یان هەر بەشێکی قوربانی دەدزێت درۆ دەکات لەگەڵ پەروەردگارا.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر نەخۆش بینی قوربانیدەکات خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*هەندێکیش دەڵێن: شیفاو چارەسەری بۆ دێت.

(نابلسی) دەڵێت: قوربانی لەخەودا بەڵگەیە وەفاو بەجێهێنانی قەرزو قوتاربوونە لەبەلاّو نەهامەتیو رزگاربوون لەنەخۆشی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رزقو بژێویو سوودی مالاّت.

*ئەگەر لەخەودا ئاژەڵێکی بڕیاردا بیکات بەقوربانی دەگونجێت لەیەکەم کاتی هەینیدا رووبکاتە مزگەوت.

*ئەگەر مانگایەکیکرد بەقوربانی لەکاتژمێری دووەمدا دێت بۆ مزگەوت لەهەینیدا.

*ئەگەر بەرانێکی کرد بەقوربانی لەکاتژمێری سێیەمدا دێت بۆ نوێژی هەینی.

*ئەگەر هێلکەیەکیکرد بەقوربانی لەکاتژمێری پێنجەمدا دێت.

*دەگونجێت قوربانی بەڵگەبێت لەسەر هەڵسوکەوتکردن بەدابەشکردنی ماڵو داراییەوە.

**قوڕ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا قوڕ نەخۆشیو سووکییە، ئەگەر بژێوی لەسەر پیشەیەك بێت وابەستەی قوڕبێت بەڵگەونیشانەی خێرە بۆی.

*بیناو ساختمانکردن بەقوڕ ئاینو دڵنیاییە.

*قوڕی وشك دزو جەردەیە.

*ئەگەر بینی قوڕکاری گۆڕی پێغەمبەریکرد(ﷺ) (حەج)دەکات بەماڵو داراییەکەی.

*ئەگەر بینی قوڕکاری ماڵی خۆیکردو قوڕەکە تەڕوشلبوو باشە.

*ئەگەر بینی قوڕەکەی خوارد ماڵو سامانێکە دەیخوات بەئەندازەی خواردنی قوڕەکە.

*قوڕی بینا رزقو رۆزییی وسوودو قازانجە.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی قوڕببینێ ترسی مردنی هەیە، ئەگەر بینی چوە نێو قوڕەوە یان کارێکی پێئەنجامدا نەخۆشیو سووکایەتی رووی تێدەکات.

*قوڕی خەستی وشك چارەسەرەو قوڕی تەڕیش چاکەو باشەیە، خواردنی

قوڕی سوورەوەکراو غەیبەتو بوختانەو قوڕ بۆ نەخۆش مردنە.

**قوڕفرۆش**:(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر فرۆشتنی ئاژەڵو مرۆڤ.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر کۆبوونەوە لەخێرو شەڕدا بەپێی پلەوپایەی خەوبینەرو هەندێکیش دەڵێن: پیاوێکە ماڵو سامانی وەردەگرێ.

**قوڕقوشم**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: قوڕقوشم بەڵگەیە لەسەر خەڵکی هەرەمەو رەشە خەڵك، هەروەها بەڵگەیە لەسەر سوود وەرگرتن لەماڵو دارایی لەرێگەی ئاگرپەرستانەوە.

*هەڵگرتنی قوڕقوشمی تواوە بەڵگەیە لەسەر زیان لەماڵو داراییدا.

*قوڕقوشمی بەستوو بەڵگە نییە لەسەر زیان.

*ئەگەر ببینێ قوڕقوشمێ دەتوێتەوە لەبارەی کاروبارێکەوە دەکەوێتە ناکۆکییەوەو لاوازیو سستی تێدایەو دەکەوێتە بەرزوبانی خەڵکی.

(نابلسی)دەڵێت: قوڕقوشم بەڵگەیە لەسەرئەوەی لێیدروستدەکرێ لەقاپو جامو قولاپی راوکردنو بۆری ئاوو ئاوەڕۆ.

**قوڕقوشمساز( قوڕقوشمچی )**:(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا خاوەن لاوازیو ناتەواوەییە.

**قوڕولیتە( قوڕی رەش )**:(نابلسی) دەڵێت: قوڕولیتە بەڵگەیەکی باشە بەتایبەت ئەگەر ئەوکەسە بێناو یان هەژاربوو بەڵگەیە لەسەر پڕکردنەوەی کەمو کوڕی بەرزقێکی کەمو کورت.

*ئەگەر کەسێکی رەبەن بینی هاوسەر دەگرێو خەزوورو خەسووی بۆ دروستدەبێت.

*قوڕولیتە بەڵگەیە لەسەر:

+کەمترین بژێوی.

+سوورکردنەوە.

*هەروەها غەمو پەژارەو بەلاو نەهامەتییە ، هەموو رەشییەك پلەوپایەو بەرزییە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+ماڵو دارایی زیادە.

+بنەماکانی سوودو قازانج.

+ئاینو چمکەکانی خێرو پایەداری.

(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر نەخۆشیك قوڕو لیتەی بینی نەخۆشیەکەی بەردەوامدەبێ مەگەر لەو قوڕاوە بێتەدەرەوە،هاتنەدەرەوەی چاك بوونەوەیەتی، ئەگەر کەسێکیتر بەنێو قوڕو چڵپاودا رۆیی دەچێتە نێو فیتنەو بەلاو نەهامەتییەوە یان زیندانی دەکرێ

یــــاخود دەکەوێتــــە دەســــتی دەســــتەڵاتدارەوە، ئەگــەر لــەقوڕو چڵپاوەکە هاتــە دەرەوە یان جلەکانی پــارێزراوبوون لەگــەڵ لــەشی لاری لــەو گونــاهو تاوانــەی هــاتوە بەســەریدا پارێزراو دەبێت.

*هـەرکات چاڵی قـوڕو چڵپاو قـوڵتربێ قــورس و ســەختتر دەبــێ لەبەڵگــەدا، هەرکاتیش بۆنەکەی خراپبوو ڕەنگیشی ڕەش داگیرســا پــتر جــەخت لەســەر حەرامیدەکاتــەوە لەگــەڵ زۆری گونـاهو خراپی نیەتی.

*بەهەمان شێواز شێلانی قـوڕو کردنـی بەخشت هیچ خێرێکی تێدا نییە چـونکە بەڵگەیە لەسـەر غـەمو پـەژارەو ئـاژاوە هەتا وشکدەبێتەوە خشتەکەیان دەبێت بەخاکو خـۆڵ، ئـەوجا دەبێت بـەماڵو سامان دوای ماندوبوونو خەمو پەژارەو بەڵاو نەهامەتی.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵاو نەهامـەتی قـوڕو چـڵپیاوو ئـاژاوەو لێڵییــە، دەگونجێـت بەڵگــەبێت لەســـەر قـــەرزاری یـــان قـــسەکردن لەســـەر ئـــابڕو ، یــاخود دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دووگیـانی ژنان بەنێرینە بـەپێی ئایـەتی: ﴿ ولقد خلقنا الإنسان من سلالة من طين﴾ (المؤمنون: ١٢).

*هەروەها قوڕو چڵپاو بەڵگەیـە لەسـەر وەستانی جموجووڵو وەستانی نوێژ.

*قوڕ ساڵێکی پڕو تەواوە.

*دەگونجێـت قـوڕ بەڵگـەبێت لەسـەر شــــانازی بەنیعمــــەت یــــاخود هاوەڵپەیداکردنو بێباوەڕی.

*ئەگـەر سـەرو ریشی قـوڕاوی بوبـوو پیاوێکـە کـشتوکاڵەکەی گرفـتو ئافـە رووی تێدەکات، ئەگـەر چڵپاوەکە بـوو بەقوڕ ستایشی باش بەدەستدەهێنێتو هەوڵەکەشــی لەگوێڕایــەڵی خوداوەنــدا دەبێت، ئەگـەر بـوو بـەئارد یان هـەویر لـەرزقو ڕۆزییەکـەی رزقێکـی حـەڵاڵو باشدەردرێ.

*ئەگـەر ڕەنگـی قـوڕی ڕەشـکۆڕا بـۆ سـوور بەڵگەیـە لەسـەر گواسـتنەوەی لەزەویەکـــەوە بـــۆ زەوییــــەکیترو لەخوورەوشتێکەوە بۆ یەکێکی دی.

*دەگونجێــت قوڕوچــڵپاو بەڵگــەبێت لەسەر ژنێکی بەدڕەوشتی خراپی ڕەقو زبر.

*ئەگـەر زەوییەکـە زەوییـەکی بێفـەڕو کەڵکبوو قـوڕو چڵپیاوی لەخـەودا تێدا

بینی بەڵگەیە لەسەر مژدەی باش‌و زۆری گژوگیا.

*ئەگەر قوڕوچڵپاوەکە لەبیردابوو بەڵگەیە لەسەر میراتی‌و دەرکەوتنی فەرویت‌و ئەسپەردەو نهێنی بۆئەوەی بیرەکە بەڵگەیە لەسەری.

**قوڕی خشت:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵ‌و دارایەکی حەلاڵە، ئەگەر بەڵگەبوو لەسەر کوڕ لەباردەچێ یان تەمەنکورتدەبێ.

*ئەگەر قوڕی خشت بەڵگەبوو لەسەر کوڕ فیتنەو زماندرێژو تەمەندرێژدەبێ.

**قولاپی تەشی:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ژنێك بینی قولاپی تەشییەکی بەدەستهێنا هاوسەردەگرێ، ئەگەر قولاپەکەی ونکردو هاوسەرداربوو تەلاقیدەدات یان کچەکەی تەلاقدەدرێت ئەگەر کچێکی هاوسەرداری هەبوو.

*ئەگەر بینی قولاپەکەی گەڕاندەوە بۆ تەشییەکە مێردەکەی دەیگەڕێنێتەوە.

*ئەگەر بینی خوریەکە دەبچڕێت بەڵێنەکەی بەجێناهێنێت.

*قولاپی تەشی بەڵگەیە لەسەر جێگیربوون لەسەر کاروبارەکان‌و بەڵگەیە بۆ ئەوەی لەسەفەردایە لەسەر ماڵ‌و دارایییەکی بەسوودو هاوسەر بۆ رەبەن.

**قومار:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: قومار شەڕو ئاژاوەو کێبەرکێیە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کارێکی بەتاڵ‌و پڕوپووچەو ئەوەی لەمرۆڤ بباتەوە لەکاتی بێداریدا لێیدەباتەوە.

**قوماشکوت:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بۆ یەکێك قوماش بەڵگەبێت لەسەری هەرکەسێك شتێك بکوتێ لەپێناوی بەرژەوەندیەکدا بینینی بەڵگەیە لەسەر پشوودان‌و بژێوی پەیداکردن بەشەڕو ئاژاوە یاخود بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی ئەوەی ئومێدی چاکبوونی لێدەکرێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خەرجکردنی ماڵ‌و سامان لەئاڵتوون‌و زیو بۆ خەڵکی شەڕەنگێزو درۆزن.

*کوتەرو خاوەن شتومەکی کۆمەڵێکن دنیایان زاڵکردوە بەسەر ئایندا ئەگەر پارەو درهەم‌و دیناریان وەرگرت، ئەگەر ئەوکەلوپەلە کوتراوەیان فرۆشت‌و نرخ‌و بەهاکەیان وەرگرت ئاینیان تێکدەدەن‌و رزق‌و رۆزییان بەوتەو شەڕو ئاژاوە دەشێوێنن‌و تەندروستی‌و لەشساغیان زاڵدەکەن بەسەر بژێوی‌و خێردا.

*ئەگەر فرۆشتیان بەلام درهەم‌و دیناریان دیارینەکرد خۆیان سپاردوە

بەکرپار چونکە رێبازی دنیانەویستی دەگرنەبەر.

*ئەگەر گەنمو جۆیانکڕی یان نرخو بەهای خۆیاندا بەلاّم درهەمو دیناریان دیارینەکرد لەدەولّەمەندیو دلّنیایدان لەبژێویانداو سوپاسو ستایشدەکەن لەسەر رزقو رۆزی.

**قوماشی تێکەڵە:** (نابلسی)دەلّێت: مالّوسامانی پیاوێکی رێزدارو پلەوپایەیە .

*هەروەها بەلّگەیە لەسەر کیژێکی شۆخو شەنگ ئەگەر لەئاسنبوو بەلّگەیە لەسەر هێزوتوانای خەوبینەر، ئەگەر لەقورقوشمبوو سستیکاروبارو ئاینەکەیەتی.

*ئەگەر لەزیوبوو بەلاّم بەزێڕ رووکەشکرابوو بەلّگەیە لەسەر خزمەتکارو بەردەستی جوانو شۆخو شەنگ.

*ئەگەر زینو لغاو بەبێ خشلّبوو بەلّگەیە لەسەر خۆبەکەمزانینی سوارەکەیو ناواخنەکەی باشترە لەناوەکەی.

**قومری (کوکوختی):** (ئیبن سیرین) دەلّێت: قومری ژنێکی خواناسە، هەروەها دەلّێن: کوڕێکە خاوەن نازو نیعمەتێکی باشە.

(نابلسی) دەلّێت: لەخەودا هەلّبەستو هۆنراوە خوێنەرو گەورەیەکی باشە.

*ئەگەر قومرییەکی بەدیکرد خێرو چاکە بەدیدەکات.

*ئەگەر چاوەڕێی کەسێکی نادیارو ئاوارەیکرد دەگەڕێتەوە بۆلای، ئەگەر چاوەڕێی پێداویستییەکیکرد بۆی بەجێدێت، ئەگەر غەمباربوو دەرووی لێدەکرێتەوە.

*ئەگەر کوکوختی لەوەرزی بەهاردا بینی پێداویستی بەجێدێت.

*ئەگەر لەوەرزێکی بەدەر لەوەرزی بەهاردا بینی بەدەستهێنانی پێداویستی دوادەکەوێ بۆ وەرزی بەهار.

*هەروەها قومری بەلّگەیە لەسەر منداڵبوون.



**قۆبچەدانەر:** (نابلسی) دەلّێت: بینینی لەخەودا بەلّگەیە لەسەر ئەوەی هەلّدەستێ بەمارەبڕین، دەگونجێت بینینی بەلّگەبێت لەسەر قورسی بۆ پێداویستیدار.

**قۆچ( شاخ ):** (نابلسی) دەلّێت: لەخەودا هێزو بەرگرییە، ئەگەر بینی شاخی هەیە دوژمن دەبەزێنێ.

*ئەگەر فەرمانڕەوایەك هاوچەشنێکی خۆی بەزاند دوو شاخی هەبوو

دەستەڵاتی بەسەر ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا دەڕوات.

*دەگونجێت قۆچ خزمێکبێت هێزو تواناو سوودی لێوەربگرێ.

*ئەگەر بینی دووشاخی هەیە لەشاخەکانی گاو ئاژەڵ بەڵگەیە لەسەر مردنو شکستهێنانی.

*شاخ بەڵگەیە لەسەر ساڵانو چەکو ئەوماڵو سامانو منداڵو شکۆمەندییەی مرۆڤ بەزوویی لەدنیادا پێیدەگات.

**قۆچەقانی (هاوێژەر)**: (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر نەخۆشێك بینی بەڵگەیە لەسەر هەڵکەندنی لەشوێنی خۆی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لابردنی ئەوەی دانراوەو وازهێنان لەتلیاکو مادده بێهۆشکەرەکان یاخود نوێنەرێکە.

*ئەگەربینی بەردێکی بەقۆچەقانی گرتە مرۆڤێك بانگدەکرێ بۆ کارێکی حەق.

*ئەگەر بینی ژنان بەردیان تێگرت جادووی لێدەکەن.

*قۆچەقانێ وتەیەکی حەقو ڕاستییە بەتوندیو ڕەقی دەکرێ، ئەگەر قۆچەقانی بەدەستی خۆیەوە بینی بەبێ ئەوەی بیهاوێژێت سوورە لەسەر قسەیەکی خۆی لەباسێکی حەقدا گەرچی دڵڕەقی تێدا بەدەر دەکەوێت.

*هەروەها دەڵێت: قۆچەقانێ ئەگەر فڕێی نەدا بەڵگەیە لەسەر تەوبەو پاشگەزبوونەوە لەگوناهو تاوان.

**قۆخ**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: قۆخ ئەگەر لەکاتی خۆیدا نەبێت نەخۆشییەکی توندوگرانە، هەروەها دەڵێن: قۆخی ترش ترسو بیمە، داری قۆخیش پیاوێکی ئازای خێرۆمەندە لەنێو خەڵکیداو ڕاوبۆچوونی توندەو لەهەرەتی لاویدا ماڵو سامان کۆدەکاتەوەو بەرلەوەی پیرببێت دەمرێت.

*قۆخی سەوز ئێشو ئازارو غەمو پەژارەیە لەلایەن براوە ڕووی تێدەکات، قۆخی زەردیش نەخۆشییە.

(نابلسی)دەڵێت: قۆخ لەخەودا ئەگەر خۆشو شیرینبوو بۆیەکێك بیخوات دەگات بەحەزو ئارەزووی خوازراو.

*ئەگەر بینی لەدارێك قۆخ لێدەکاتەوە لەپیاوێکی نەخۆشەوە ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت.

*قۆخو هاوچەشنەکانی جگە لە(توو) نەبێت ئەگەر مرۆڤ یەکێکیانی بەدیکرد

لەکاتی وەرزی ئەو بەروبوومەدا بەڵگەیە لەسەر تام و چێژو قوڵبڕین، ئەگەر لەکاتی خۆیدانەبوو بەڵگەیە لەسەر ماندوبوون و ناحەقی و بەتاڵی.

*قۆخ لەخەودا مژدەیە بەگەڕانەوەی ئەو خێرەی لەکیسچووەو ئاگاداریشە بۆ شەڕێك بەسەرچوەو قۆخیش براو هاوڕێیەکی رەفتار بەرزە.

**قۆڕبوون:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەرکەس لەخەودا ببینێ قۆڕبوە ماڵ و دارایییەك بەدەستدەهێنێت هەمیشە لەبەرچاوو دەستی دوژمنانیدا دەبێت، ئەوەی ئەندامێکی ئێش و ژان بیگرێت لەخەودا کەسە نزیکەکانی قسەی بەدو خراپدەکەن بەرانبەری.

**قۆلنج**[1]: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر تووشی ئەو نەخۆشییەبوو منداڵەکانی هەژاردەکەون و سزاو خەشم رووی تێدەکات.

* هەروەها دەڵێن: ئێش و ئازاری سك بەڵگەیە لەسەر لەشساغی خزمەنزیکەکان و خانەوادە.

(نابلسی) دەڵێت: بۆژن دووگیانییە یاخود تێکەڵبوونە لەگەڵ پیاوخراپایان و قسەو وتەی بەئێش وئازارە.

**قۆڵ:** ئەگەر ئێش و ژانیکرد بەڵگەیە لەسەر غەم وپەژارەو بەتاڵبوونەوەی ئەو رووداوەی کەبەدەست ئەنجامدەدرێت و بەڵگەشە لەسەر نەبوونی خزمەتگوزاری.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی بەقۆڵی پێوانەیکرد سەفەرێکی دووردەکەوێتەبەری، ئەگەر سڕیەوە بەپەنجەی لەشوێنێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکیتر.

(نابلسی) دەڵێت: قۆڵ و ئەندازە لەخەودا سەفەرە، ئەو سەفەرەش بەئەندازەی باڵێکە، ئەگەر بەباڵی جل وبەرگەکەی بڕی یان دیوارو زەوی سەفەردەکات بۆ گوندێك، ئەگەر زەوییەکی گسکدا بە قۆڵی(حەج)و تێکۆشان و سەفەریکی دوورو درێژدەکات.

## قە

**قەپان( تەرازوو ):** قەپان فەرمانڕەوایەکی دەستەڵاتدارەو بزمارەکەی دامەزران و راوەستانی مولکەکەیەتی و دووپشکی

---

[1] **قۆلنج:** نەخۆشییەکی بەئێش و ئازارە دەدات لەریخۆڵەو پیسایی بەئەستەم دێتە دەرەوە. (نهاية الأرب: ١١/١٧٣).

نهێنییە(ئەوبەشەی لەدووپشکدەچێت) زنجیرەکەشی بەردەستەکانیەتی‌و تاکانیشی گوێیەتی‌و کیلۆکانی دادگایی‌و دادپەروەرییەتی.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کوڕ یان هاوسەری رەوشت سووك‌و نزم یاخود رەوشتبەر.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر:

+زانیاری.

+رێنومایی.

+شوێنکەوتنی حەق.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دادوەری خاوەن بەردەست‌و پەردەوان.

**قەتایف**[1] : (ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵ‌و سامان‌و تام‌و چێژو خۆشحاڵییە.

**قەتران( رۆناوگ )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵ‌و سامانێکە بەناپاکی دەستگیردەبێ ، پیسبوونی جل‌وبەرگە لەبژێوی پەیداکردنداو رژانی بەسەر مرۆڤێکدا تومەتبارکردنیەتی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە رێگە لەخراپەکاران دەگرێ چونکە کرمدەکوژێ، ئەگەر یەکێك خۆی پێچەورکرد یان جل‌وبەرگێکی قەتراناوی پۆشی روو لەسەرپێچیدەکات

[1] **قەتایف**: جۆرە شیرینییەکە پتر لەرەمەزاندا دروستدەکرێ. (وەرگێڕ)

بەپێی وتەی پەروەردگار دەربارەی دۆزەخیەکان دەفەرموێت: ﴿سرابيلهم من قطران﴾ (ابراهيم: ٥٠).

**قەتێ**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ژنێکی شۆخ‌و شەنگ‌و جوانە بەجوانی سەرسامدەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+راستگۆیی.

+رەوانبێژی.

+خۆشەویستی‌و تەبایی.

**قەرز( وام )**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ملکەچی‌و رسواییە.

*ئەگەر بینی قەرزێکدەداتەوە یان حەقێکدەداتەوە پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنێت‌و هەژارێك تێردەکات‌و کاروبارێکی قورس‌وگرانی دنیای بۆ ئاساندەبێت یاخود کاروبارێکی ئاین.

*هەروەها دەڵێن: مافدانەوە گەڕانەوەیە لەسەفەر.

*ئەگەر بینی لەخەودا وابەستەی قەرزێکە‌و خۆشی دانی پێدادەنێت بەڵام لەبێداریدا نازانێت شوێنەوارەکانی گوناهو تاوانە کەدەوریداوە لەگەڵ کرداری قورس‌و گران بۆی‌و لەدنیادا سزا دەدرێت یان بەڵاو نەهامەتییە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی قەرز بەخەڵکیدەدات لەپێناوی خوایا ماڵو دارایی دەبەخشێ لەپێناوی تێکۆشانو جیهادو بەپێی ئایەتی: ﴿إن تقرضوا الله﴾(التغابن : ١٧).

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا خێرە قەرزدەر دەیکات بەقەرزکارو پێداویستی بەوەی داوایدەکات.

*قەرز بەڵگەیە لەسەر تەوبە بۆ سەرپێچیکارو موسوڵمانبوونی بێباوەڕو دەوڵەمەندییە بۆ هەژار، ئەگەر شتێکی بەخشی نرخداربوو ئەگەر داوای لێکرد بەڵگەیە لەسەر باش مامەڵەکردن لەگەڵ پەروەردگارەکەی.

*قەرز بەڵگەیە لەسەر لەخۆبوردوویی‌و جوامێری لەبەرخودا ، ئەگەر نەخۆشێك بینی قەرزدەدات بەڵگەیە لەسەر نارەحەتی تووشیدەبێت، ئەگەر بینی ئەوەی دەیدا بەقەرز وەریدەگرێت بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*ئەگەر بینی قەرزپێدەرەکەیمرد لەغەمو پەژارە رزگاریدەبێت.

**قەرزدانەوە:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی قەرزدەداتەوەو حەقێك دەگەیەنێ سۆزو بەزەییە یاخود ناندەدات بەهەژارێك‌و کارێکی قورس‌و گرانی ئاین‌و دنیای بۆ پێشدێت.

*دەڵێن: حەق گەیاندن گەڕاندنەوەیە لەسەفەر هەروەك چۆن گەڕانەوەی لەسەفەر حەقدانەوەیە.

**قەزاوقەدەری خوایی:**(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر مرۆڤ لەخەودا بینی روو لەدەروون یان ماڵو سامانیدەکات بەڵگەیە لەسەر بەدەستکەوتنی پاداشتی زۆر یاخود دەچێتە پێش لەکارێك پێشتر لێی ترساوەو یاخود دەرەنجامەکەی باشدەبێ بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): "سوێندبێ بەخوا هەر قەزاو چارەنووسێ بۆ مرۆڤێك ئەنجامبدرێت خێری تێدایە بۆی"[1].

**قەزوان:**(نابلسی) دەڵێت: قەزوان لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بیرکردن یان سەفەر ئەوەی ببینێ هەڵدەزنێ بەدار قەزوانێکدا خێرێکی دەستگیردەبێت یان گوێبیستی قسەو وتەیەکدەبێت پێی شادو کامەراندەبێت.

**قەساب:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: قەساب فریشتەی مردنە، ئەگەر بینی چەقۆیەکی لەقەسابێك وەرگرت

---

[1](ئەحمەد) هێناویەتی لە(مسندە) کەیدا (١٢٠٩٩)و (هەیسەمی) لە (المجمع) دا (٢١٠/٧).

تووشـدەبێ پاشـان چـاكدەبێتەوەو چوستو چالاكی رووی تێدەكاتەوە.

* ئەگەر بینی ئەو ئاژەلانە سەردەبڕێ كەحـەلاڵ نییـە بەلگـەی ستەمیەتی لەگـەڵ تێكـەڵبوونی كاروبـاری لـەنێوان خۆیو خوای گەورە.

* ئەگـەر بینـی بـاوكی سـەربڕی چـاكدەبێت لەگـەڵی ئەگـەر خـوێنی لێنـەهات ، ئەگـەر خـوێنی بینـی خەونەكەی باش نییە.

* هـەروەها دەلـێن: قەسـاب بەلگـەی نارەحەتیو گرانییە لەهەموو حالێكدا ، مەگەر لەدوو حاڵدا نەبێ یەكـەم/كاتی قـەرزاری ئـەوجا بەلگەیەلەسـەر قەرزدانـەوە. دووەم/كاتێـك كـۆتو بەنـدبێ ئـەوجا بەلگەیـە لەسـەر كردنەوەی.

* ئەو قەسابەی دەدرێتـەپاڵ فریشتەی مـردن كەسێكی نادیـارە بـەلام ناسـراو بەشكەری میراتییە لەنێوان میراتداران.

* هـەروەها دەلـێن: خوێنرێـژە یـان شمشێرو چەك بەدەستە.

* ئەگـەر بینـی گۆشـت دابەشـدەكات لەنێو خەڵكیدا دووزووبانیدەكات.

* ئەگـەر بینـی گۆشتی مانگا لـەنێوان خزمەكانیدا بەشدەكات ئەگەر خێركـارو چـاكخوازبێ پەیوەنـدی خزمایـەتی بەجێـدەهێنێ هـەروەها مـاڵو سـامانەكەی لـەنێوان میراتبـەرانی بەدادپـەوەری بەجێـدەهێنێ لـەحاڵی ژیانداو ژن بۆ كوڕەكانی دەهێنێ.

* پێست داماڵ پیاوێكی ستەمكارە وەك بازرگـان مـاف لەخـەڵكی زەوتـدەكاتو ماڵو سامانیان بەفیڕۆدەدات.

(نابلـسی) دەلێـت: ئەگـەر فەرمانڕەوایـەكی بینـی ژێردەسـتەكانی سـەربڕیو زوڵـمو سـتەمیان لێـدەكات، بینینـی ئـەو قەسـابانەی گۆشـت هەڵدەواسنو دەیفرۆشن لەبازاڕ بەلگەیە لەسـەر سـەختیو نارەحـەتیو بۆنەخۆشـیش زیـان پێكەوتنـە لەگـەڵ سەختیو توندی.

* بینینی قەسـاب بـۆ غـەمبارو زینـدانی بەلگـەی خێـرو دەرووە چـونكە ئەندامەكان لەیەكدی جیادەكاتەوە.

* ئەگەر قەسابێكی كوشت قوتـاردەبێ لەنەخۆشی.

* قەسـاب بەلگەیـە لەسـەر خـاوەنی كەسـێتیو مـاڵو سـامان دابەشـكار لەنێوان میراتگراندا.

**قەشـە**: (نابلـسی) دەلێـت: ئەگـەر قەشەیەكی لەخەودا بینـی بیدعـەكارەو رۆدەچێت لەبیدعەكەیدا.

* ئەگـەر بینـی بـوە بەقەشـەیەك پیاهەڵـدانێكی باشـدەكرێ بـەلام

حاڵوبـاری قورسـدەبێت لەسـەریو دەروازەکـانی رزقو رۆزی ئەسـتەمو گرانـدەبنو لەهـەموو کاروبارێکـدا ملکەچیو ترسوبیم رووی تێدەکات.

*بەڵگەیـە لەسـەر پیـاوێکی ناپـاکو فرۆفێڵاوی بیدعەکار.

**قەفەس:** (نابلسی) دەڵێت: لەخـەودا زیندانییە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لانکە بۆ منداڵ.

*قەفـەس لانـەو ماڵـە ، ئەگـەر بینـی مریشكو لانـەی كـرِی كـچێكدەهێنێیو، لەماڵەکەیدا نیشتەجێیدەكات.

*ئەگـەر بینـی سـەریکرد بـەنێو قەفەسـەکەداو لـەنێو بـازاڕدا دەڕوات لانـەو ماڵەکـەی دەفرۆشـێو گەواهیدەدەن بەسەریەوە.

*قەفـەس بەڵگەیـە لەسـەر تێـچوونو ئاڵۆزی کاروبارەکان بەنێویەکدا.

*دادوەر بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری.

**قەفەسساز:** (نابلسی) دەڵێ: لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر سـاختمانو بینـاو بەیەککەیەنەری هاوسەران، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+پەروەرشیاری منداڵان.

+زیندانەوان.

+چنەر.

**قـەفیز:** (نابلسی) دەڵێت: لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر غـەمو پـەژارە یـان دەرووی خێـر یـاخود ئـەوەی دەچێتە نێویو کێشانەی پێ ئەنجام دەدرێت.

*قـەفیز بەڵگەیـە لەسـەر پـارێزەری نهێنی لەمرۆڤو شتیتر.

**قەلـەڕەش:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: قەلەڕەش پیاوێکی نائەمینو بێزارکارەو خوازیـاری گرانکردنـی شـتومەکەو وتـەکانی بەڵگەیـە لەسـەر هـاتنی خێـر لەکەسێکی غەریبەوە.

(نابلـسی) دەڵێـت: ئەگـەر بینـی قەلەڕەشـێکی هێنـا پیـاوێکی ناپـاکی خراپـەکار دەپێکـێ، ئەگـەر بینـی قەلەڕەشێ رامدەکات هەوڵی باشکردنی کارێکی خراپدەدات.

(نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا پیـاوێکی پلەوپایەبەرزی بەئارامو هێمنە.

**قەلەڕەشـێکی بەڵـەك بەڵـەك:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: پیـاوێکی فێڵبـازەو لەرۆیـشتندا خـۆی بەگـەورە دەزانـێو رژدە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر قەلەڕەشێکی راوکرد ماڵێکی حـەرام بەدەستدەهێنێ بەخراپـەو فێـڵ، هـەروەها دەڵـێن: پیاوێکی درۆزنی ناپاکە.

*ئەگـەر بینـی قەلەڕەشـێکی بەدەسـتهێنا لـەخۆبایبوونو کاروبـاری پووچو بەتاڵە.

* ئەگەر قەلەڕەشی راوکرد دەستکەوت بەدەستدەهێنێ بەرێگەی پووچ وبەتاڵ.
* ئەگەر قەلەڕەشێك هاتەگۆ لەگەڵی غەمو پەژارە دایدەگرێ پاشان دەرووی لێدەکرێتەوە.
* ئەگەر گۆشتی قەلەڕەشی خواردو ماڵو سامان لەکۆمەڵێ دزەوە بەدەستدەهێنێ.
* ئەگەر قەلەڕەشێکی لەبەردەرکی فەرمانڕەواو سەرکردەیەك بینی گوناهو تاوانێك ئەنجامدەداتو پاشان لێی پاکەزدەبێتەوە یاخود هەڵدەستێ بەکوشتنی براکەی پاشان تەوبە دەکات بەپێی ئایەتی: ﴿فبعث الله غرابا يبحث في الأرض ليريه﴾ (المائدة: ٣١).
* ئەگەر بەچنگی برینداریکرد لەسەرما رەقدەبێتەوە یاخود کۆمەڵێکی ستەمکار توندوتیژ دەبن لەگەڵیو ئێش وئازار رووی تێدەکات.
* هەروەها دەڵێن: قەلەڕەش بەڵگەی تەمەندرێژییە.
* (نەسری کوڕی ئەحمەد) لەخەودابینی لەسەرکورسییەکەی دانیشتبوو، قەلەڕەشێك هاتو کلاوەکەی بەدەنووك کونکرد، ئنجا لەسەری خستیەخوارەوەو ئەویش لەسەر جێگەکەی هاتەخوارەوەو کلاوەکەی بەرزکردەوەو لەسەرسەری دانیا،پاشان خەوەکەی بۆ راڤەکارێك گێڕایەوە کە(حیوە)ی (نیشابوری)بوو ئەویش وتی: کەسێکی خانەوادەکەی خۆت بەرەنگارت دەبێتەوە لەو دەستەلاتەدا کەهەتە پاشان بڕیارو دەستەلات هەر بۆ خۆت دەگەڕێتەوە، ئنجا( ئەبا ئیسحاق) (سامانی) یاخیبوو کاروباری تێکداو پاشان کاروبارەکە گەڕایەوە ژێردەستی خۆی.
* هەروەها یەکێك بینی قەلەڕەشێك لەسەر (کابە)یە، خەوەکەی بۆ (ئیبن سیرین) گێڕایەوەو وتی: پیاو خراپێك ژنێکی رێزدار دەهێنێ، پاشان (حەجاج کچی (عبدالله)ی کوڕی(جەعفەر)ی کوڕی (ئەبی تالیب)ی هێنا.
* بینینی قەلەڕەش لەشوێنێکدا باش نییە، ئەگەر قەلەڕەشێکی لەماڵەکەی خۆیدابینی بەڵگەیە لەسەر پیاوێك خیانەتی لێدەکاتو دەستی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا تێکەڵکردوە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر هەڵمەتبردنی پیاوێکی دەستەلاتدار بۆسەر ماڵەکەی.

(نابلسی) دەڵێت: قەلەڕەش شومە ئەگەر لەسەر کشتوکاڵ یا دارێك ببینرێ، ئەگەر قەلەڕەشێکی بینی

گفتوگــۆی لەگەڵــدەکرد کــوڕێکی خراپەکاری دەبێت.
(ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بـەڵکو غـەم و پەژارەیەکی زۆر ڕووی تێدەکات پاشان قوتاردەبێ.
*قەلەڕەش بەڵگەیە لەسەر جیابوونەوە لەخۆشەویستان و غەریبی.
*ئەگەر قەلەڕەشێکی پێسپێرا خۆشی و شادی بەدەستدەهێنێ.
*قەلەڕەشـی بەڵـەك بەڵـەك بەڵگەیـە لەســـەر تەمەندرێـــژی و مانـــەوەی شتومەك و خۆشی یان بەڵگەیە لەسەر پیریـــی بـــەهۆی تەمەندرێـــژی قەلەڕەشەوە.
*لەباڵنـدەکانی زسـتانە بۆیـە بەڵگەیـە لەســەر ســەرماو سـۆڵەو تێکـچوون و شێوان.
*ئەگەر قەلەڕەشێکی بەڵـەك بەڵـەکبوو چاوی گەش و ڕۆشندەبێ پێی، ئەگـەر بـوو بـەخاوەنی کـوڕێکی خراپـەکارەو سـەربرینی زەفەربردنـە بـەکوڕێك یـا هەواڵێك ڕووی تێدەکات.
*ئەگەر بینی قەلەڕەش دەدوێ لەگەڵی کوڕێکی پیسیدەبێت.
*ئەگـەر چـەند قەلەڕەشـێکی بینـی لەماڵی خۆیدا ماڵ و دارایی و شکۆمەندی بەدەستدەهێنێ هەتا کۆتایی تەمەنی.

*هـەروەها بەڵگەیـە لەسـەر خـەڵکێکی زماندرێژی زۆربڵە.
*قەلـــەڕەش پیـــاوێکی جـــەنگاوەری ستەمکارە لەگەڵ بەختدایە دەگونجێت بەڵگـەبێت لەســەر ســووربوون لەســەر بژێوی.
*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر کاروبـــاری شـــاراوە لەزەویـــداو ئەسـپەردەکردنی مـردوو، خوداوەنـد دەفـــەرموێت: ﴿فبعــث الله غرابــا يبحث في الارض ليريه كيف يواري سوءة أخيه﴾ (المائدة: ٣١).
*ئەگـەر قەلەڕەشـێکی بینـی ڕاوی بـۆ دەکـرد دەسـتکەوت لەشـتی بـەتاڵ و پووچدا بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر قەلەڕەشێکی لەشوێنێکدا بینی لەوشـوێنەدا مرۆڤێکـی ئـاوارەو غـەریب دەمرێ.
*ئەگـەر قەلەڕەشـێکی بینـی لەزەویـدا دەگـــەڕا کارێـــك ئەنجامـــدەدات پاشـگەزدەبێتەوە لێـی، یـان دەڵـێن: شـتێکی بـۆ دەردەکـەوێ تێکـەڵبووبێت لێی و نەزانێت چیبکات وەك کوڕەکـەی (ئادەم) چۆن نەیدەزانی تەرمی براکەی بـــشارێتەوە دوای کوشـــتنی و قەلەڕەشەکە فێریکرد.

*دەگونجێت قەلەڕەش بەڵگەبێت لەسەر:

+ئاوارەیی.

+ڕەشبینی بەهەواڵو دەنگو باس.

+غەمو پەژارە.

+سەفەری دوورودرێژ.

+ئەوەی پێویست دەکات دوعای لێبکات لەخزمو کەس‌وکار یان دەستەلاتدارێکی ستەمکار.

*قەلەڕەشی نێو کشتوکاڵ بەڵگەیە لەسەر کوڕێك بەزینا لەدایکبووبێ لەگەڵ پیاوێکی تێکەڵە لەخێروشەڕ.

*ئەگەر قەلەڕەشێکی بینی بەسەر کشتوکاڵێکەوە ئەو کشتوکاڵە بەلاو ئافە لێیدەدات.

*قەلەڕەش مرۆڤێکی خراپەکاری درۆزنە، ئەگەر بینی چارەسەری قەلەڕەشێکدەکات چارەسەری مرۆڤێکدەکات بەو چەشنەیە.

*ئەگەر بینی قەلەڕەشێکی گرت بەدەستی لەخۆباییبوونە لەگەڵ داوایەکی پووچو بەتاڵ.

*ئەگەر قەلەڕەشێکی لەماڵو لانەیەك بینی مرۆڤێکی بەدو خراپە.

*ئەگەر بینی قەلەڕەشێك ڕاوی بۆدەکات دەستکەوت بەدەستدەهێنێ بەدرۆو کاری پووچو بەتاڵیشە.

*ئەگەر قەلەڕەشێکی بەڵەك بەڵەکی بین شتێك دەبینێ پێی سەرسامدەبێ لەکاتی بێداریداو ئەوشتە هیچ خێرێکی تێدا نییە.

*ئەگەر قەلەڕەشێکی لەشوێنێکدا بینی لەزەویدا کارێکدەکات لێی پاشگەزدەبێتەوە، هەروەها دەڵێن: کارێکی بۆ سەرهەڵدەدات پاشگەزدەبێتەوە هەروەك چۆن سەریهەڵدا بۆ نەوەی(ئادەم) لەکوشتنی براکەیدا.

**قەلەڕەشێکی سووری دەنووکدار:** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی چەکمەبۆری ئارەزووبازی خاوەن دەستەلات.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر نەتەوەیەك یان کۆمەڵێکی هەژار یاخود پێکدادانو بژێوی بەبێبوونی هیچ بنەمایەك.

**قەڵا:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی ببینێ لەسەر قەڵایەك یان لەنێویدایە دەمرێتو هیچ خێروچاکەی نییە بەپێی ئایەتی: ﴿أينما تكونوا يدرككم الموتُ ولـو كنـتم في بُـروج مُـشَيَّدة﴾ (النساء:٧٨).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر مرۆڤ لەخەودا بینی لەنێو قەڵایەکدایە دڵنیا نەبێت لەوەی بۆیدەچێتو خوازیاریەتی، ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێت، هەروەها دەڵێن: ئەوەی ببینێ وەك ئەوەی لەسەر قەراغی قەڵایەك یان دیوارێکە زەفەر بەپیاوێکی مەزنی مەترسیدار دەبات.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: قەڵا قەڵغانە لەئایندا بۆ یەکێك خۆی ببینێ تێدا لەگەڵ یەکێکدا کاروبارەکانی بۆ کۆدەبێتەوەو لەکاروباری دنیادا زاڵدەبێت هەروەها نزیکدەبێتەوە لەفەوتانو تیاچوون چونکە هەموو تەواوییەك ناتەواوی رووی تێدەکات.

(نابلسی)دەڵێت: قەڵا بەڵگەیە لەسەر راستگۆیی خاوەنەکەی بەپێی ئەو وتەیەی دەڵێت: راستگۆیی قەڵایە.

*دەگونجێت قەڵا بەڵگەبێت لەسەر خاوەنەکەی یاخود ئەو سەربازانەی تێدان یان دوژمنان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+زانیاریو قورئانو ئەوەی مرۆڤ خۆی پێدەپارێزێ لەشەیتانو سەربازەکانی ، قەڵاتەکانی فەرمانڕەواکانیەتیو دەرگاکانیشی پاسەوانەکانەو قوللەکانی وەزیرو ماڵانی دەوروبەریشی خزمو کەسوکارو دەرگاوانیەتی.

*ئەگەر خۆی لەقەڵایەکدا بینیەوە ئەگەر شایستەی موڵكو دەستەڵاتبوو پێیدەگات یاخود هاوسەردەگیرێت ئەگەر رەبەنبوو یاخوداوەند مناڵێکی کوڕی پێدەبەخشێ یاخود موڵکێك دەکرێ، ئەگەر بێباوەڕبوو بڕوادەهێنێت یان تەوبەدەکات لەسەرجەم گوناهو تاوانەکانی.

*قەڵا بەڵگەیە لەسەر ئیسلام ، ئەگەر بینی لەقەڵایەکدایە خواناسیو دینداریو چاکەی پێدەبەخشریۆ لەگوناهو تاوان پاشگەزدەبێتەوە بەئەندازەی شوێنو جێگەی لەقەڵاکەدا.

*ئەگەر ئەو قەڵایە لەکاتی بێداریدا لەئاوێکدا یان لەبیابانێکدابوو دوژمنەکەی زاڵدەبێت بەسەریا، ئەگەر لەبیانێکدابوو بەڵام لەخەوەکەدا کەوتە چیایەکەوە یان لەنێو ئاودابوو لەجەنگو شەڕدا بەدەستی بەتاڵدەگەڕێتەوە.

*ئەگەر بینی قەڵایەك بینادەکات پارێزراودەبێت لەدوژمنەکانی یاخود عەورەتو ماڵودارایی پارێزراودەبێتو لەملکەچیو سەرشۆڕی بەدوور دەبێت.

*ئەگەر بینی قەلاَکەی یان ئەو ماڵو کۆشکەکەی وێراندەکات تێکچوونی ئاینو دنیایەتی یاخود مردنی هاوسەرەکەیەتی.

*ئەگەر بینی لەبەردەمی پەنجەرەو قەلاَیەك دانیشتوە بەهۆی براو سەرۆكو کوڕەکەیەوە قوتاردەبێت.

*هەروەها وتراوە: قەلاَ پیاوێکی پارێزراوەو کەس پێیناوێرێت، ئەوەی لەدوورەوە قەلاَ ببینێ پلەوپایەی بەرز دەبێتەوەو عەورەتی پارێزراو دەبێت.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: قەلاَ کۆتایی هێنانی غەمو پەژارەیەو دەروازەی خێرە.

*قەلاَ یەکێکە لەپادشاو سەرکردەکانو لەخێرەوە دەچێت بۆ شەر.

*ئەگەر بینی چوە نێو قەلاَیەك رزقو رۆزیو دنیانەویستی لەئاینەکەیدا بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر قەلاَیەکی لەدوورەوە بینی لەشوێنێکەوە دەچێت بۆ شوێنێکی دیکەو پلەوپایەو ناوبانگی بەرزدەبێتەوە.

*ئەگەر بینی قەلاَیەکی دروستکرد عەورەتی لەحەرام دەپارێزێو ماڵو دارایشی لەبەلاَو نەهامەتی.

*ئەگەر بینی قەلاَکەی وێرانبوو یان لانەو کۆشکەکەی تێکچوونی ئاینو دنیایەتی یان مەرگی هاوسەرەکەیەتی.

*ئەگەر خۆی لەقەلاَیەکدا بینی یان لەشار یاخود لەحەشارگەیەکدا چاکی پێدەبەخشرێ لەگەڵ خواناسیو یەکلایی بوونەوە بۆ ئەوکارە.

*ئەگەر بینی لەبەر پەنجەرەی قەلاَیەکدا دانیشتوە برا یا سەرکردە یاخود باوکی بانگدەکاتو بەهۆیەوە قوتاردەبێ.

*هەروەها دەڵێن: قەلاَ پیاوێکی پارێزراوە کەس توانای بەسەریانییە، ئەگەر لەدوورەوە بینی بەرزی ناوبانگو پلەوپایەیەتیو پاراستنی عەورەتە لەحەرام.

*ئەگەر بینی لەناوەوە خۆی هەڵواسیوە بەقەلاَیەکدا یان لەدەرەوەی قەلاَدا خۆی هەڵواسیوە حاڵو باری لەئایندا بەو شێوەیەیە.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی ببینێ لەقەلاَیەکدا خۆی حەشارداوە سەردەکەوێت.

(نابلسی) دەڵێت: قەلاَ وازهێنانە لەگوناهو تاوان ، هەروەها قەلاَ بەپیاوێکی مەزن راڤەدەکرێ.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی قەلاَیەکی ئازادکرد کچێکدەکات بەژن.

**قەلای شەترەنج:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جێگیربوون لەکاروبارەکاندا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+داپۆشین.

+مەرگی ناکاووکتوپڕ.

+راستگۆیی.

*بۆ دووگیانیش بەڵگەیە لەسەر لەدایکبوونی کچ.

**قەڵغان:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: قەڵغان پیاوێکی رەوشتبەرزی گوێڕایەڵو مشوورخۆری براکانیەتی لەهەموو شتێکدا کەپەیوەندی بەکاری چاكو جوانەوە هەیە، هەروەها پارێزگاریان لێدەکاتو پشتگیریاندەکاتو لەخراپە دووریاندەخاتەوە.

*هەروەها دەڵێن: شتێکە سوێندی پیدەخورێ یا کوڕێکە نەزانو نەفام دەبێت بەرانبەر باوکی.

*قەڵغانی سپی پیاوێکی خاوەن ئاینو پلەوپایەیە، قەڵغانی سەوز پیاوی ئاینداره هی سوور پیاوی ئارەزووبازی شەڕەنگێزە، رەشیش پیاوی ماڵو ساماندارو شکۆمەندە، قەڵغانی رەنگاوڕەنگیش پیاوی تێکەڵوپێکەڵە.

*ئەگەر لەگەڵ قەڵغاندا چەکی بەدیکرد دوژمنەکانی ناتوانن زیانی پێبگەیەنن.

*ئەگەر زەڕەنگەر یان بازرگان قەڵغانێکی بینی لەگەڵ شتومەکی خۆی یان لەنێو فرۆشگاکەی دانرابوو یاخود لای ئەوانەی مامەڵەی لەگەڵدەکردن پیاوێکی سوێندخۆرە، سوێندەکەشی وەك پەناو قەڵغانێکە لەفرۆشوکرێندا، بەڵگەش ئایەتی: ﴿اتخذوا أيمانهم جُنَّة﴾(المجادلة:١٦).

*ئەگەر بینی قەڵغانێکی نییەو کوڕیشی هەبوو کوڕەکەی لەخراپە بەدووری دەگرێتو بژێویو پێداویستی دابیندەکات.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی خۆی بداتە پاڵ قەڵغان یا قەڵغانێك بگرێت بەدەستەوە پەنادەبات بۆ پیاوێکی بەهێزو دەیکات بەپەناو پشتگیری خۆی.

*هەروەها وتراوە: ئەگەر قەڵغانەکە بەنرخبوو بەڵگەیە لەسەر ژنی دەوڵەمەندی جوانو شۆخو شەنگ، وەگەرنا ژنێکی ناشیرینە.

(نابلسی)دەڵێت: قەڵغان لەخەودا پەناگەو پارێزەرە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر

رۆژوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:
((رۆژو قەڵغانە - پارێزەرە))[1].

*دەگونجێت بەڵگەش بێت لەسەر هاورێیەکی رکەبەر.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: قەڵغان قەڵاوپەنایە، ئەوەی دەیپۆشێ پلەوپایەیەکی مەزن بەدەستدەهێنێت، پۆشین و لەخۆدانی هەموو جۆرێکی چەك پارێزگارییە لەدژی دوژمن، قەڵغان پارێزگاری و مسۆگەری ئاینە بۆ سەرجەم خەڵکی نیعمەت و پارێزگارییە لەبەڵاو نەهامەتی و فروفێڵ. خوداوەند دەفەرموێت: ﴿ سَرَابِيلَ تَقِيكُم الْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُمْ بَأْسَكُمْ كَذَلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُم ﴾ (النحل:٨٠) هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَكُمْ لِتُحْصِنَكُمْ مِنْ بَأْسِكُمْ ﴾ (الأنبياء:٨٠).

*ئەگەر بینی وەك ئەوەی قەڵغان دروستدەكات شارێكی تۆكمەو بەهێز دروستدەكات، قەڵغان پۆشی بەڵگەیە لەسەر براو پەناوپشتگیر یان كوڕێكی بەسۆزو دڵسۆزو، پۆشینی بۆ بازرگان چاكەیەكە پێیدەگات یاخود بازرگانییەكی هەمیشەییە لەگەڵ هێمنی و پارێزگاریی.

*وتراویشە:
١) قەڵغان ماڵ و موڵكە.
٢) هەموو وابەستەیەكی جەنگ وەك قەڵغان و كڵاوو ...

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر هاورێیبوو پیاوێكی بەخشندەو پەناو پشتگیرە بۆ یەكێك پەنای پێبگرێت، پارێزەرە بۆ ئەوەی پەنای پێدەگرێت و كوڕێكیشە بڕێوی خۆی پەیدادەكات و بەتواناو هێزە، هەروەها بۆ یەكێك لەبەرییبكات نیعمەتێكە لەلایەن پیاوێكەوە هەروەك باسكراو لەنهێنی و ئاشكرادا دەیپارێزێت و لەپلان و فێڵی پیلانگێڕان قوتاریدەكات.

*ئەگەر بینی قەڵغانێكی پۆشیوەو قەڵغانەكە لەئاسن دروستكراوە پارێزگاریی ئایینە.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی قەڵغانێك بپۆشێت ماڵ و موڵك بەدەستدەهێنێت.

*قەڵغان بەڵگەیە لەسەر هێمنی و دڵنیایی لەترس و بیمو پاراستنی ئابرووی هاوسەرو ماڵ.

*قەڵغان بۆ ژن پەچەیە یاخود مێردێكە بیپارێزێت.

*پۆشینی قەڵغان بەڵگەیە لەسەر براو پەناوپشتگیر یاخود كوڕێكی بەسۆزو میهر.

*هەروەها دەڵێن: قەڵغان ماڵ و موڵكە.

---

[1] (بوخاری) (١٨٩٤) و (مسلم) (١٦٢/٢٨٥/٤) لەفەرمودەیەكی (ئەبوهورەیرە)ەوە.

*ئەو چەکەی وەك قەڵغانو خودە وایە بەڵگەیە لەسەر جلوبەگو پۆشاك هەردوو باڵی ئەگەر لەئاسنبوو خزمو خۆشییە، ئەوەی ببینێ دووباسکی هەیە بەهێزو پەنادار دەبێت بەهۆی پیاوێکی خزمیەوە، هەروەها دەڵێن: هاوڕێیەتی دووپیاو دەکات بەهێزو مەزنن.

*دەگونجێت لێکدانەوەی قەڵغان وابەستەی کوڕو براکەیبێت.

*ئەگەر بینی دووباڵی ئاسنی هەیە کوڕو هێزە لەسەفەردا.

**قەڵغانچی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: لەخەودا دەستەڵاتێکی بەهێزە هاندەری سوپایە دژ بەدوژمنانی فریووی دوژمنانی دەدات بەدوژمنانی، تیروپشکیش دەستەڵاتە.

**قەڵەوی لەشولاری مرۆڤ:** (ئیبن سیرین) دەڵت: قەڵەویو هێز لەلاشەدا هێزی ئاینو باوەڕە، ئەگەر بینی لەشولاریبوە بەلەشو لاری مارێك هەڵدەستێت بەدەرخستنی دژایەتیو دوژمنایەتی پەنهان.

*ئەگەر بینی دووگی هەیە وەك دوگی بەران کوڕێکی هەیە دوای خۆیدەژی.

*ئەگەر بینی لەشو لاری لەئاسنە یاخود لەبەردە دەمرێت.

*ئەگەر زیادەیەکی لەلەشو لاریدا بینی بەبێتەوەی زیانی هەبێت زیادەی نیعمەتەکە دەڕژێت بەسەریا.

*پیاوێکی سادەو هەژار هات بۆ لای راڤەکارێکی خەو وتی: بینیم لەشولارم زیادیکردوە وەك ئەوەی نورو رووناکیم هەبێ لەوەدەچوو روو بەزوهدو خوانای چووبم لەنێو چیاو دەشتو دۆڵەکاندا دەگەڕام، راڤەکاری خەوەکە پێیوت: تۆ شایستەی دەستەڵاتدەبیتو موڵكو دەستەڵات بەدەستدەهێنیتو ماڵو سامانو شکۆمەندیت زیاد دەکات، پاشان زۆرینەبرد لەگەڵ غەزاکاراندا چوو بۆ غەزاو پیاوێکی ئازابوو موشریکەکانی بەزاندو ماڵوسامانو دەستکەوتی بەدەستهێنا.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی قەڵەوە ماڵوسامانی زیاد دەکات، ئەگەر لەگەڵ قەڵەویدا جلوبەرگێکی ئالتوونی لەبەردابوو نەخۆشدەکەویو چاکدەبێتەوە.

*هەروەها دەڵێن: قەڵەوی لەشو لار بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندی.

*هەروەها دەڵێن: قەڵەوی لەشو لار هێزو باوەڕە.

*هەروەها دەڵێن: قەڵەوی بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندیو پلەوپایەی بەرز.

**قـەمبووری:** (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: ئەگەربینی قەمبووربوە ماڵو داراییەکی زۆری بەدەسـتدەهێنێت لەگـەڵ موڵـكو دەسـتەلآت لەلایـەن خـزمو کەسـێکی بەهێزترە.

(نابلـسی)دەڵێـت: لەگـەڵ ئـەوەدا سروشـتی پـاكو بێگـەرد بەدەستدەهێنێت، هـەروەها قـەمبووری ناوبـانگو قەرزارییەکـە ئەسـتەمە دانەوەی چونکە پشت وەك بار وایە، دەگونجێت گوناهو تاوان بێت.

*وتراوە: قەمبووریی تەمەندرێژییە یان منداڵە.

**قەند(شەکری کلۆ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخـەودا رزقو رۆزییـە بەمانـدوبوونو غەمو پەژارە دەستگیردەبێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

+دەرووی خێر دوای نارەحەتی.

+منداڵبوونی دووگیان.

+سـەرەتای خـەریکبوون بـەزانیاریو قورئانخوێندنو پیشەسازییەوە.

+ماڵێکی مۆڵی دەستبەدەست.

**قەیسی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: قەیسی نەخۆشـییە، خـواردنی قەیـسی سـەوز دینارکردنـە بـەخێرو چـاکبوونەوەیە لەنەخۆشـی، خـواردنی قەیـسی زەرد خەرجکردنی ماڵوسامانە لەنەخۆشیدا.

*ئەگـەربینی قەیـسی لـەدارێك دەکاتـەوەو دەیخـوات هاوەلآیـەتی پیـاوێکی دەوڵەمەنـدی رەوش خراپدەکات.

*هەروەها وتراوە: لێکردنەوەی قەیسی لەدارەکەی هاوسەرگیرییە لەگەڵ ژنێکدا ماڵو سامانی میراتی لەژێر دەستدایە.

*ئەگەربینی هەندێك لەدەستەلآتداران قەیـسیان لـەدارێکی سـێولێکردەوە مـاڵێکی خـراپ دەخاتـە دەسـتی ژێردەستەکانی.

*دارقەیـسی پیـاوێکی دەردەدارو فـرە نەخۆشییە.

*هەندێکـدەڵێن: بـەڵکو پیـاوێکی رووگـرژە بـۆ خانەوادەکـەیو لەگـەڵ خەڵکیداکراوەو چاونەترسە.

*ئەگەر قەیسیەکی سـەوزبوو پیـاوێکی فرە درهەمە.

*ئەگەر لقێکی لەدار قەیسی شکاندەوە نکـوولی لـەماڵو سـامانێکدەکات لـەلای پیاوێکـەوە یـاخود واز لەنوێـژو رۆژوو دەهێنێت.

*ئەگەر لەدارێکی زڕ لقێکی شکاند هەتا بیکات بەگۆچان خۆشـیو شـادی لێـوە بەدیدەهێنێت.

*ئەو بەروبوومانەی رەنگیان زەردە نەخۆشنو ئەوەی ترشە غەمو پەژارەیەو سەوزەكانیان نەخۆشی نییە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا كۆمەڵە دیناریكی زۆرە ئەگەر لەكاتی خۆی یان لەكاتی خۆیدانەبوو.

*دار قەیسی پیاوێكی نەخۆشەو هیچ كەڵكو سوودی نییە.

*ئەگەر دارەكە قورسبوو بەو بەربوومەی هەڵیگرتوە پیاوێكی خاوەن ماڵو دارایییە.

*هەروەها دارقەیسی پیاوێكی رووگەشی رژدە لەگەڵ خانەوادەكەیو لەخودی خۆشیدا ئازایە.

*ئەگەربینی بەروبوومەكەی سەوزە بەڵگەیە لەسەر درهەم ، ئەگەر زەردبوو بەڵگەیە لەسەر دینار.

*ئەگەربینی لقێكی شكاند لەدارێكی بێبەروبووم ناكۆكیو دژایەتی دەكات لەگەڵ كەسێكی نزیكی.

*ئەوەی دارو درەخت چاكبكات ئەمانەت دەگەیەنێ.

*هەموو دارو درەختێك لەكاتی خۆیدا بەروبوومی لێبكرێتەوە خۆشیو چێژو خزمەتكارە بەدەر لەتوو، ئەگەر لەكاتی خۆیدا نەبوو ماندوبوونێكی پووچە.

*ئەگەر فەرمانڕەوایەك بینی لەدارسێو قەیسی لێكردەوە لەژێر دەستەكانی پارەی ستەمكاری وەردەگرێ.

*قەیسی بەڵگەیە لەسەر ترس‌وبیم، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرگەڕانەوەی شتەكان بۆ دۆخی رابردوویان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رزقو رۆزییەكی خۆشو بەتام.

## ق ی

**قیامەت( رۆژی دوایی، رۆژی زیندوبوونەوە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: (ئەبی عوبەیدەی تەستوری) دەڵێت: لەخەودا بینیم قیامەت هەڵساوەو خەڵكی كۆبوونەتەوە، یەكێك بانگیكرد: خەڵكینە ئەوەی لەدنیادا برسیبوو بائامادەی نانخواردن بێت، خەڵكی یەك بەیەك هەڵسان، پاشان بانگكرا: (باوكی عوبەید هەستە) هەستامو سفرەدانرا لەدڵی خۆمدا وتم: پێمخۆش نییە لەدوای ئەوانەوەبم.

*(ئەحمەد)ی كوڕی (مسروق) دەگێڕێتەوە دەڵێت: لەخەودا بینیم قیامەت هەڵساوەو خەڵكی كۆبوونەتەوەو یەكێك بانگیكرد: كاتی نوێژی بەكۆمەڵە ، ئنجا خەڵكی ریزیانبەست فریشتەیەك هات رووخساری بەئەندازەی میلێك دەبوو

وتی: بچۆرە پیشەوەو بەرنوێژی بۆ خەڵکی بکە، تەماشای رووخسارمکرد لەنێو چاوانیدا نووسرابوو (جوبرەئیل)ی (ئەمین) منیش وتم: ئەی کوا پێغەمبەری (ﷺ) ئەویش وتی: سەرقاڵی دانانی سفرەیە بۆ دنیا نەویستان.

*(ئەبوسەعد) (رەحمەتی خوای لێبێت)دەفەرموێ: ﴿ ونضع الموازين القسط ليوم القيامة فلا تظلم نفس شيئا ﴾ (الأنبياء: ٤٧).

*هەرکەس ببینێ قیامەت هەڵساوە لەشوێنێکدا دادپەروەری بڵاودەبێتەوە لەوشوێنەداو تۆڵە لەستەمکاران دەکرێتەوە چونکە ئەو رۆژە رۆژی جیاکردنەوەو دادپەروەییە.

*ئەگەر بینی مەرجێك لەمەرجەکانی قیامەت هاتەپێش وەك هەڵهاتنی خۆر لەرۆژئاواوەو هاتنە دەرەوەی زیندەوەری دواو یاخود سەرهەڵدانی (دەجال)و (یأجوج ومأجوج)، ئەگەر گوێرایەڵی خوداوەندبێت خەونەکەی مژدەیە بۆی، ئەگەر سەرپێچیکاربێت یان خەریکبێت سەرپێچی بکات خەونەی ئاگادارییە بۆی.

*ئەگەر بینی قیامەت هەڵساوەو ئەویش لەبەردەمی پەروەردگاردا راگیراوە خەونەکەی بەهێزو پتەوترەو سەرهەڵدانی حەق خێراترە.

*هەروەها ئەگەر بینی لەخەودا گۆڕەکان شەقیانبردوەو مردوو لەگۆڕدێنەدەرەوە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر بڵاوبوونەوەی دادپەوەری.

*ئەگەر بینی قیامەت بەرپابوەو خۆشی لەجەنگدابوو سەردەکەوێ.

*ئەگەر خۆی لەقیامەتدا بینیەوە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر سەفەر، ئەگەر هەر خۆی بەتەنیا حەشرکرا لەگەڵ یەکێکیتر خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر ستەمکارە بەپێی ئایەتی: ﴿احشروا الذين ظلموا وأزواجهم ﴾ (الصافات: ٢٢).

*ئەگەر بینی قیامەت بەرپابوە بەتەنیا هەر بۆ خۆی خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر مردنی بەپێی ئەو فەرموودەیەی دەڵێت: " ئەوەی بمرێ قیامەتی بەرپابوە".

*ئەگەر بینی قیامەت بەرپابوەو سەختیو ناڕەحەتیەکانی داهاتوون بەڵگەیە لەسەر هاتنی ستەم بەدوای دادپەوەریدا لەلایەن کۆمەڵێکەوە چاوەڕێی ستەمی لێنەکردوون.

*ئەو خەونە بەڵگەیە لەسەرئەوەی خاوەنەکەی سەرقاڵە بەئەنجامدانی گوناهو تاوان‌و داوای کاری دەگمەن‌و مەحاڵدەکات‌و تەوبەدەکات لەسەری یاخود سووردەبێت لەسەر درۆکردن بەپێی ئایەتی: ﴿ ولو ردوا لعادوا لما نهوا عنه وانهم لكاذبون﴾ (الأنعام:٨).

*ئەگەر بینی لەلێپرسینەوە نزیکبوەتەوە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر نکوولیکردنی لەخێرو پشتهەڵکردن لەحەق بەپێی ئایەتی: ﴿اقترب للناس حسابهم وهم في غفلة معرضون﴾ (الأنبياء: ١).

*ئەگەر بینی مامەڵەو لێپرسینەوەیەکی سووکی لەگەڵ ئەنجامدرا خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر باشی ئاینەکەی.

*ئەگەر بینی بەتوندی مامەڵەی لەگەڵکرا خەوەکەی بەڵگەیە لەسەرئەوەی رووی تێدەکات بەپێی ئایەتی:﴿ فحاسبناها حسابا شديدا﴾(الطلاق: ٨).

*ئەگەر بینی خوداوەند لێی دەپرسێتەوەو کردارەکانی خراوەتە نێوکێشانەوەو چاکەکانی قورستربوون لەخراپەکانی لەگوێراپەڵیەکی مەزندایەو خوداوەند پاداشتێکی مەزنی دەداتەوە، ئەگەر خراپەکانی قورستربوون لەچاکەکانی مەترسی لەسەر ئاینەکەی هەیە.

*ئەگەر بینی کێشانەکە بەدەستییەوەبوو لەسەر رێبازێکی راست‌و رێك بەپێی ئایەتی: ﴿ وأنزلنا معهم الكتاب والميزان ﴾ (الحديد:٢٥).

*ئەگەر بینی فەرمانێکیاندایەو پێیانوت: بخوێنە، ئەگەر لەچاکەکاران بێت شادی‌و دڵخۆشی رووی تێدەکات، ئەگەر وانەبێ حاڵی مەترسیدارە بەپێی ئایەتی: ﴿ اقرأ كتابك ﴾ (الإسراء:١٤).

*ئەگەر خۆی لەسەر (صراط) دییەوە جێگیرە لەسەر ئاین ، ئەگەر بینی لەسەر (صراط)لایداو لەکێشانەو دەگریا خوازیاری ئاسانکردنی کاروبارەکانیەتی پشتبەخوا لەرۆژی قیامەتدا.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ئاگادارییە بۆیەکێك خەریکبێ سەرپێچییەك ئەنجامبدات قیامەتیش دادپەوەرییەو حەقسەندنەوەیە لەستەمکار بۆستەملێکراو.

*ئەگەر یەکێك لەجەنگاوەران بینی قیامەت بەرپابوە تیاچوونی گروهو کۆمەڵی ستەمکار نزیکە بەسەرکەوتنی خوایی.

*زەوی قیامەت ژنێکی ڕێزدارە یان پیاوێکی بەڕێزی بەسوودە، فووکردن بەکەڕەنەدا قوتاربوونی پیاوچاکانە.
*ئەگەر بینی قیامەت لەشارێك یان گوندێك بەرپابوە یاخود ڕۆژ لەرۆژئاواوە هەڵهاتوە یان هەر نیشانەیەکیتری قیامەتو زیندوبوونەوە دێت بەدووی یەکدا هەتا دەگاتە بەشی پاداشتو سزا مژدەدەرە بۆیەکێك کاری چاکە ئەنجامبدات بەئاسانیو بۆئەوەشی کاری خراپە دەکات ئاگادارییە هەتا تەوبەبکاتو پاشگەزببێتەوە.
*ئەگەر قیامەتی لەخەودا بینی بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی نیشانەیەکی قیامەت وەك خوێنڕشتنو دەرکەوتنی کاری ناقۆڵاو بەدکاریی.
*هەروەها قیامەت بەڵگەیە لەسەر نیشانەکانی خراپەو بینینی ئەوەش یادخەرەوەیە بۆخەوبینەر.
*ئەگەر بینی گۆڕەکان قلیشاونو مردوەکان لەگۆڕەکان بەدەرکەوتوون دادپەوەری لەو شوێنەدا بلاَدەبێتەوە.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی قیامەت بەرپابوە لەشەڕی دوژمنانی قوتاردەبێ یاخود فیتنەو ئاشووب لەنێو خەڵکی شارو وڵاتدا بەرپا دەبێ کەتێدا بینراوە.

*ئەگەر نیشانەیەکی قیامەتی بینی وەك فووکردن بەکەڕەنا یاخود هاتنەدەرەوەی مردووان لەگۆڕ یاهەڵهاتنی رۆژ لەرۆژئاواوە لێکدانەوەی وەك لێکدانەوەی رۆژی قیامەت وایە.
*هەروەها دەڵێن: هاتنە دەرەوەی زیندەوەران سەرهەڵدانی فیتنەیەو تێدا کۆمەڵێك قوتاردەبنو کۆمەڵێکیش تیادەچن.
*سەرهەڵدانی (دەجال) دەرکەوتنی پیاوێکی بیدعەکارەو وێڵیو سەرگەردانی لەنێو خەڵکیدا بلاَودەکاتەوە.
*فووکردن بەکەڕەنا کۆکەرەشەو نەخۆشییە یاخود ئاگادارییە لەدەستەلاَتدارەوە لەناردنی یەکێك یاخود ڕووداوێك لەوشارە دەقەومێ یان سەفەرێکی گشتییە لە(حەج)یاخود جیهادو تێکۆشان.
*ئەگەر بینی خوداوەند خەڵکی زیندودەکاتەوە بۆ جیاکرنەوە یان لێپرسینەوەیان دادپەوەریی خواییە لەنێو خەڵکیدا بلاَودەبێتەوە، یان پێشەواو ئیمامێکی دادپەوەرە یاخود رۆژێکی مەزنە خەڵکی دەیبینێنو سەریان پێدەسوڕمێ.
*ئەگەر بینی نامەی کردارەکانی بەدەستی راستی وەرگرت چاکەو دەوڵەمەندیو شکۆداری

بەدەستدەهێنێت ، ئەگەر بەدەستی چەپی وەریگرت بەگوناهو تاوان‌و هەژاری‌و پێداویستی تیادەچێت.

*ئەگەر بینی بەسەر پردی (صراط)دا رۆیی بەسەلامەتی قوتاردەبێ لەناڕەحەتیەکی گەورەو گران.

**قیبلەو رووگەی نوێژخوێن لەنوێژدا:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی روو بەرۆژهەلات نوێژدەکات پیاوێکی مەزهەب خراپ‌و فرە بوختانە بۆ خەڵکی‌و چاو نەترسە لە بۆگوناه چونکە لەگەڵ جوولەکەدا هاوڕایەو ئەوانیش بەو چەشنەن.

*ئەگەر رووی لەبەرانبەری رۆژهەلاتبوو پیاوێکی بیدعەچی سەرقاڵە بەکاری پڕوپووچەوە.

*ئەگەر رووی لەپشتی (کابە)بوو ئیسلامی وازلێهێناوە بەئەنجامدانی گوناهی گەورە یان سوێندخواردنی درۆ یاخود توهمەتبارکردنی داوێنپاك‌و خۆنەپاراستن لەگوناهو تاوان‌و چاودێری خوداوەند لەدەستدەدات.

*ئەگەر بینی رووگەو قیبلە نازانێ یاخود بینی بۆیدەگەڕێ‌و نایدۆزێتەوە لەئاینەکەیدا سەرسامدەبێت.

*ئەگەر بینی روو بەقیبلە نوێژدەکات ئەوە ئاینەکەی جێگیرە ، خۆئەگەر نوێژ روو بە شوێنێکی بەدەر لە(کابە)یکردو جل‌وبەرگی سپی پۆشیبوو قورئانی بەدروستی خوێندەوە(حەج)دەکات.

*ئەگەر روو بەرۆژهەلات نوێژیدەکرد هەمان بۆچوونی قەدەریەکانی هەیەو هاوتای رای مەسیحیەکانە.

**قیرات**[1] : (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ناخۆشییە بەهۆی قەرزەوە تووشی دەبێت کەلەئەستۆیدایە.

**قیرتاو:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کاروبارو ئاسانگەر یاخود بڕەری قوماشی ئەستوور.

**قیمە(گۆشتی وردوردکراو):** دەگونجێت بۆ رەبەن بەڵگەبێت لەسەرهاوسەرو بۆ دووگیان کوڕبێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تێکەڵکردنی ماڵ‌و سامان لەگەڵ شەریکەکانی‌و ئەنجامی سوودو قازانجی نێوانیان.

---

[1] **قیرات:** ١/٢٤ی دینارێك و لەکێشانەشدا (٤) دەنکە گەنمە (فەرهەنگی دەریا: ٢/١٠٠٩).

# کاف



## کا

**کا**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: کا ماڵێکی زۆرو فەرپداره بۆئەوەی بەدەستی بهێنیٚ یان بیباتە ماڵەکەی.

*دەگێڕنەوە(ئیبن سیرین) سەیری کایەك دەکات لەبێداریداو دەڵێت: خۆزگە لەخەودا بوایە ، هەروەها دەڵێن: ئەوەی کا ببینیٚ لەخەودا فەردەو توورەکەی بۆ هەڵبدوریٚ چونکە ماڵو داراییەکی زۆرەو شوێنەوارەکەی پێدا دیاری دەدات، یاخود ماڵێکی کەمە زۆرپشی چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردنە پێوەی.

(نابلسی)دەڵێت: کا ماڵێکە بەماندوبوون دەستگیر دەبێت چونکە دوای کوتان بەدەستدێت. ئەوەی لەخەودا ببینیٚ کای لایە رزقو رۆزی حەلاڵ بەدەستدەهێنێت بۆخۆی، ئەگەر لەخەودا لێیخوارد نرخی فرۆشتنی وەردەگرێتو دەیخوات یان برسێتیو نەبوونی رووی تێدەکات.

ئەگەر لەشوێنو جێگەی ناشیاو داینا وەك سندووقو گەنجینە بەڵگەیە لەسەر گرانیو مردنی ئاژەڵ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خێرو چاکە چونکە لەماڵو دارایی زیادەیە.

*زۆری کا لەولاتدا بەڵگەیە لەسەر زۆری رووەك، بەڵگەشە لەسەر رووەك، کای گەنم بەڵگەیە لەسەر گەنم، کای پاقلەش بەڵگەیە لەسەر پاقلە ، هی نۆکیش لەسەر نۆك.

**کابە(کەعبە)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی نوێژ لە(کابە)دا دەکات زاڵدەبیٚ بەسەر هەندێك لەرێزدارو شکۆمەنداداو دڵنیاییو خێری دەستگیردەبیٚ.

*ئەگەر بینی شتێکی لە(کابە) برد کارو رووداوێکی لەدەستەلاتدارەوە بەدەستدیٚ.

*(کابە) لەخەودا فەرمانرەوا یان بەرپرسە یاخود وەزیرە رمانی

دیوارەکەی بەڵگەیە لەسەر مەرگی فەرمانڕەوا.

*بینینی (کابە)لەخەودا مژدەی خێروچاکەیە یاخود ئاگادارییە بەشەڕو غەمو پەژارە.

*ئەگەر بینی (کابە) بوە بەماڵو لانەی ئەوە خزمەتکاری بەردەوامی دەبێو ناوبانگو شکۆمەندیشی دەبێ، مەگەر (کابە) لەشێوەیەکی خراپدا بەدی بکات ئەمەش هیچ خێرێکی تێدا نییە.

*ئەگەر بینی لانەو ماڵی بوە بە(کابە) ڕێزی لێدەگرێ.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی چوەتە نێو (کابە)وە پشت بەخوا دەچێتە نێوی.

*ئەگەر بینی هەنارێکی لە(کابە) دزی دەچێتە نێوی.

*ئەگەر بینی لەسەر (کابە) نوێژدەکات ئاینی تێکدەچێ.

*ئەگەر بینی دەستەڵاتو پۆستێکی لە(مەککە) پێ سپێرا فەرمانڕەوا هەندێکاری پێدەسپێردرێ.

*ئەگەر بینی روو بە(کابە)چوو ئاینەکەی باشدەبێ.

*ئەگەر بینی لە(کابە) پیسایکرد بەڵگەیە لەسەر بەلاو نەهامەتی روو لەفەرمانڕەوا دەکات.

*ئەگەر بینی دراوسێی (مەککە)یە تەواوپڕ دەبێ.

*ئەگەر بینی لە(مەککە)دایەو لەگەڵ مردوانداو پرسیاری لێدەکەن بەشەهیدی دەمرێ.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم لەسەر (کابە) نوێژدەکەم ، ئەویش وتی: لەخوابترسە من وادەبینم لەئیسلام دەرچوویی.

*ئەندازیارێك لەخەودا دەبینێ چوەتە نێو (حرم)ەوە لەسەر (کابە) نوێژدەکات، خەونەکەی بۆ راڤەکارێکی خەو دەگێڕێتەوە ئەویش دەڵێ: دڵنیاییو دەستەلاتێك وەردەگری باج لەهەموولایەکەوە کۆدەکەیتەوە، وێڕای خراپی بۆچوونو پێچەوانەبوونی سوننەت.

*پیاوێکیتر دەبینێ بازدەدات بەسەر (کابە)دا پاشان بۆ (ئیبن سیرین) ی دەگێڕێتەوەو ئەویش دەڵێ: پیاوێکی پێچەوانی سوننەتی پێغەمبەری (ﷺ)و دوای ئارەزووی خۆت کەوتووی.

*دەگونجێت (کابە) بەڵگەبێت لەسەر نوێژ چونکە رووگەی نوێژ خوێنانەو بەڵگەیە لەسەر مزگەوت چونکە ماڵی خوایە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەرنەوەی وابەستەی دەبێتو ڕێنموویی ئەو وەردەگرێو پاشگەزدەبێتەوە لەکارەکانی.
*هەروەها دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەهەشت چونکە ماڵی خوایەو بەهەشتیش ماڵی خودایە.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مزگەوتەکانیتر بەڵگەیە لەسەری.
*ئەگەر بینی (کابە)بوە بەماڵی ئەو خەڵکی رووی تێدەکەنو ریزیان بەستوە لەبەردەرگایدا خاوەن زانیارییە یاخود کچێکی ڕێزداری هەیەو هاتوون بۆ داخوازی.
*ئەگەر لەدەوری (کابە)بوو یاخود هەندێك لەرێورەسمەکانی جێبەجێدەکرد خزمەتی دەستەلاَتدار دەکات یان خواناسێ یا باوكو دایك یاخود هاوسەر یان گەورەیەك بەئامۆژگاریو خۆماندوکردن.
*ئەگەر بینی چوەنێو (کابە) هاوسەرزدەگرێ ئەگەر رەبەن بێتو، ئەگەر بێباوەڕبوو موسوڵماندەبێ ئەگەر بێئاگابوو دیسان دەگەڕێتەوە بۆ چاکەکاریو ئەگەر ئازاری دڵی دایكو باوکیدابوو چاکدەبێتەوە لەگەڵیان، وەگەرنا دەچێتە ماڵی فەرمانڕەوا بۆ کارێك لەبێداریدا بەڵگەیە لەسەری، بەلاَم ئەگەر لەکاتی بێداریدا بترسێ دڵنیادەبێو ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێ.
*ئەگەر کەسێك (کابە)ی بینی لەشارێك یان گەرەکێك ئەگەر خەونەکە تایبەتبوو بەخەوبینەرەوەو کەسی نەدی لەخەوەکەیدا تەماشای حاڵیدەکرێ ئەگەر چاوەڕێی ژنبێ مارەیدەکاتو زۆر چاوەڕێدەبێ.
*ئەگەر کەسێکی بێئاگا لەئاین بینی یاخود نوێژی وازلێهێنابوو بۆ ئەوکەوسە ئاگادارییە لەوازهێنانی لەوەی کەوا دەبوو بیکاتو لەڕووکردنە شوێنێك، هەروەها بۆکەسێك (حەج)ی ماڵی خوای لەئەستۆدابێ بەلاَم خۆی لێبێئاگابکات، ئەگەر هیچکام لەوانە نەبوو خەوەکەش هی زانایەکبوو خەڵکی لەدەوری کۆدەبوونەوە لەخەوەکەداو دەنگەدەنگیان لەدەوری دروستدەکرد دەستەلاَتدارێکی دادپەروەر کاروباریان دەبات بەڕێوەو پیاوێکی زانا یان کەسێکی ناسراو لە(حەج) دەگەڕێتەوە یان لەسەفەرێکی دوور یان لەماڵی خۆی دەچێتەدەرەوە بەهۆی کارەساتو ڕووداوێکە کەرووی تێدەکات یان فەرزێك کەدێتە ئەستۆی یان مردوویەکی دەمرێتو خەڵکی

شـوێنی دەکـەونو بـەدەوریا دوعـا دەکەن.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی نوێژی تێداکرد زاڵدەبێت بەسەر فەرمانڕەواو پێشەوایەکی ڕێزدار یاخود دڵنیادەبێ لەدوژمنانو خێری دەستگیر دەبێ لێویان.

*ئەگەر چوە (بیت العتیق) دەچێتە لای فەرمانڕەوا.

*ئەگەر بینی یەکێك لەدیوارەکانی کەوتو ڕما بەڵگەیە لەسەر مەرگی فەرمانڕەوا.

*ئەگەر هات بۆ (کابە) بەڵام هیچ سرووتێکی بەجێنەهێنا لەقیامەتدا ئەو فەرزانەی بەجێهێناوە خودا لەسەری داناوە یان کەفارەتی سوێندەکەیداوە.

*ئەگەر بینی دزی لە(کابە)کرد دەچێتە لای مەحرەمێکی خۆی.

*ئەگەر فریشتەکانی بینی لەئاسمان دابەزیو پایەکانی (بیت)یان بەرزکردەوەو لەشارێکدا دایاننا فیتنەو ئاشوب لەو زەوییەدا دەکەوێتەوە.

*ئەگەر بینی (کابە)سووتاوە وازی لەنوێژ هێناوە.

*ئەگەر (کابە)ی بینی زیاد یان کەمیکردبوو یاخود لەحاڵوباری خۆی گۆڕانکارییەکی بەسەردا هاتبوو لێکدانەوەی دەدرێتە پاڵ فەرمانڕەوا.

*ئەگەر بینی گەڕا بەدەوری(کابە)دا یاخود یەکێك لەسرووتەکانی بەجێگەیاند چاکییە لەئاینەکەیدا.

*ئەگەر بینی ڕوویکردە (کابە) ڕوودەکاتە ئەوەی حاڵوباری ئاینەکەی چاکدەکات لەگەڵ دنیایدا یان ڕوودەکاتە فەرمانڕەوا هەتا تێکەڵ بەهەندێك لەبەرپرسەکانی ببێت.

*ئەگەر بینی (کابە) هاتوەتە نێوماڵەکەیو لەخزمەتی دەستەڵاتداردا نەبوو ژنێکی ڕێزدا دەهێنێ لەچاکەکاران.

*(کابە) بەڵگەیە لەسەر نوێژ چونکە ڕووگەی موسوڵمانانە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر مزگەوت چونکە ماڵی خوایە.

*بۆ یەکێك ڕووی تێبکات بەڵگەیە لەسەر:

+ڕێنومایيو قورئانو سوننەت.

+کوڕ.

+زانا.

+گەورەو هاوسەرو دایك.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر بەهەشت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر (حەج)و ئاپۆڕەو بازاڕو خۆشحاڵی.

*ئەگەر بینی (کابە)بوە بەماڵیو خەڵکی ڕووی تێدەکەنو وەستاون

لەبەردەرگاکەی دەستەڵاتێك بەدەستدەهێنێ یان بەهۆی زانیارییەکەوە یاخود کارێك کەئەنجامیداوە.

*ئەگەر بینی بەدەوری (کابە)دا دەسووڕێتەوە یاخود یەکێك لەسرووتەکانی جێبەجێدەکات خزمەتی دەستەڵاتدار یا زاناو خواناس یاخود دایكو باوك یا هاوسەرو گەورەیەك دەکات بەئامۆژگاریو چاکەلەگەڵکردنو خۆرەنجاندن بۆ بەرانبەر.

**کاتژمێر:** ئەوەی کاتژمێرێك ببینێ (درهەم)و (دینار)ی بەپێی دیاریکردنی کاتەکە دەستدەکەوێ.

*کاتژمێری وەڵامدانەوەی دوعا لەرۆژی هەینیدا یان کاتی خوێندنی زیکرو ویرد بەڵگەیە لەسەر لابردنی بەڵاو نەهامەتیو دەوڵەمەندبوونی هەژارو بەجێهێنانی بەڵێن.

*هەروەها دەڵێن: کاتژمێری دەست لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پێشکەوتن بەیارمەتی هاوڕێیەك کەدەستەڵاتێکی گەورەی هەیە.

*کاتژمێری دیوار:بەکات لێکدەدرێتەوە، ئەگەر لەنمرەیەکی دیاریکراودا لێدا لەساتەکانی شەووڕۆژ چاکبوونی حاڵو بارە ئەگەر هەڵدەستا بەئەنجامدانی کارێك.

**کاتژمێری خۆڵی شووشەیی:** ئەگەربینی شتێك دێت بەسەریا لێکدانەوەی بەپێی خێرو شەڕ دەبێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر جوانکاری.

**کار:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کرداری ناتەواو بەڵگەیە لەسەر نائومێدبوون لەوەی خوازیاریەتیو روودانی ناتەواوی لەسەرکردایەتیدا.

(نابلسی) دەڵێت: کاری ناتەواو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بێکاریو کاری تەواویش بەڵگەیە لەسەر ژیان.

*ئەگەر بینی کارێکی خێر ئەنجامدەدات خوازیاری منداڵی نێرینەیەو خوداوەند پێی دەبەخشێو بەڵگەی خێرە بۆ دەوڵەمەندو کەسانی بەهێزو هەروەها بەڵگەیە لەسەر موڵكو پلەوپایەی فراوانو بەرین.

**کارا( بکەر):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هەژاریو دەوڵەمەندی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەرو دوودڵی لەداواکردنی بژێویداو هەڵگری غەمو پەژارەی کەسانیتر لەگەڵ ئارامگرتن لەسەر ئەوەی تێدایە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر هەڵبەستی قسەو جوانکاریی حەلاڵ تێکەڵ بەحەرامدەکات.

*کارا (بکەر) پیاوێکە خەڵکی هاندەدات دژ بەیەك، ئەگەر کارێکیشی ئەنجامدا بۆ خوداوەندیدەکات، ئەگەر تەمو مژ کەوتەسەری سوود لەو تەپو تۆزە وەردەگرێ بەئەندازەی خۆی، ئەگەر تەپو تۆز نەکەوتەسەری هیچ سوودێکی لێوەرناگرێ.

*ئەگەر بینی بکەر مالآن لەبندەردەهێنێ لەگەڵ دیوارداو هەندێکی دەخرێ بەسەر هەندێکیتردا بێزاریو نارەحەتی لەنێوان کەسانێکدا روودەدات لەو شوێنەدا یاخود دەمرن.

*ئەگەر بینی بەدەستی کارێك ئەنجامدەدرێت وەك هەڵکەندن بەپاچ کردگاری پەروەردگارە، پاچیش پیاوێکە خەڵکی بەکێشدەکات بۆ لای خۆیو دەچێتە نێو کرۆکی ئەو باسەوە.

**کارپەکخستن**: (نابلسی)دەڵێت: پەکخستنی ئەوکاروبارانەی ناتوانێ بەجێی بهێنێ ئەگەر ژنبوو جیابوونەوەو دانیشتن بۆ خۆی دەهێنێ یاخود شوونەکردنو گۆشەگیرییە.

**کارگەچی**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئارامگرتنو چوستو چالاکی لەهەموو کاروبارێکدا.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر رزقو بژێویو سوودو قازانج.

**کاروان**: (نابلسی) دەڵێت: ئاژەڵ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کەلوپەلو پێداویستی باش ، کاروانیش : پشوو سەفەرو گواستنەوەیە ، هەروەها (ئیبن سیرین) دەڵێت: گەشتیاری ژن ژنێکی ئازادی دەوڵەمەندە.

**کاری چاکە**: (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی غەمو پەژارەو شاییو ئاهەنگە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر هەرەشەو گریانو شیوەن.

**کاشی**: (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی لەجێگەی مەرمەڕ دانراوە بەڵگەیە لەسەر گۆڕانی پلەوپایەو هاوسەرو شوێنو جێو بژێوی، هەروەها ئەگەر مەرمەڕ لەجێگەی کاشی دانرابوو بەڵگەیە لەسەر پێچەوانەی شەڕ بەخێر.

*ئەگەر کاشی بینی لەشوێنێك گونجاوو پێویستبوو بەڵگەیە لەسەر تەباییو کۆبوونەوەو شاییو رەواندنەوەی غەمو پەژارەو رزقو رۆزیو نوێبوونەوەی جلوبەرگ.

**کاغەز( تیانووس ):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەکاغەزێکدا دەنووسی نکوولییە لەگەڵ خەڵکیدا.

*هەروەها دەڵێن: نووسەر پیاوێکی غەمباری بەلاّو نەهامەتیدارەو هەمیشە لەدڵەراوکەدایەو خوداوەند رێنومابیدەکات لەو غەمو پەژارەیە قوتاردەبێ.

*ئەگەر بینی پێشەوایەك کاغەزێکی دایە داوای شتێکدەکات لەئیمامو دەیدۆزێتەوە.

**کاغەزفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە هاوکاری خاوەن پلانو فێڵدەکات.

**کافرۆش( ئالیکفرۆش ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی بەخشندەی ماڵو ساماندارە.

(نابلسی) دەڵێت: پیاوێکی بەخشندەی دەوڵەمەندەو باسی چاکەکانیدەکرێ.

*بینی کافرۆش بەڵگەیە لەسەر هەستان بەبەرژەوەندی کەسانیتر یان هەڵسوکەوتکار بەرزقو رۆزی هەژارو ئەوانەی لەسەفەردان یان تەمەڵی.

**کافور:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کافور پیاهەڵدانی باشە لەگەڵ پلەوپایەو شکۆمەندی.

(نابلسی) دەڵێت: کافور بەڵگەیە لەسەر خێر بەنهێنیو دووگیانبوونی ئافرەت.

*ئەگەر لەگەڵ مردوو یان پیردا بینرا بەڵگەیە لەسەرکرداری چاكو حەشرکردنی لەگەڵ چاکەکاران.

**کاکیلەی مرۆڤ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی کاکیلەیەکی ئێشو ئازاری هەیە قسەو وتەیەکی خراپ دەبیستێ لەکەسێکی نزیکییەوەو مامەڵەیەکی توندو رەقی لەگەڵدەکات بەئەندازەی ئێشو ئازارەکەی کەهەیەتی.

(نابلسی) دەڵێت: کاکیلە لەخەودا گەورەی نەتەوە یان ریش سپییەکەیانە، ئەو کاکیلەیەشی دەکەوێت یان هەردانێك بەڵگەیە لەسەر کەموکوڕی لەماڵو داراییدا یان مردنی کەسانێك.

*کاکیلە خانەوادەی پیاوە دووڕوەکان یاخود ئەوانەی خۆی پێدەنوێنێ یان ئەو مندالاّنەی نەگەیشتوون بەئاستێ.

*ئەگەر بینی کاکیلەی دەرهێناوە دەمرێت، هەروەها دەڵێن: ئەگەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە یاخود ئەگەر ئەمانەتێکی لابوو دەیدات بەخاوەنەکەی یان پەیوەندیو رایەڵەی خزمایەتی دەبڕێت لەنێوان ئەوەی کاکیلەکەی دەدرێتەپاڵ.

**کـالانی شمـشێر**: (نابلـسی)دەڵێـت: **لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نهێنیپارێز.**

***هـەروەها دەڵـێن: کـالانی شمـشێر بەڵگەیـە لەسـەر مـاڵودارایی پـارێز یـا شـتومەکپارێز، هـەروەها بینینـی بەڵگەیە لەسەر :**

+سەفەر.

+کوڕێـك مـرۆڤ بەسەرشـانیەوە هەڵیبگرێت.

**کالا( شتومەك )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئـەوەی کـالاو شـتومەك بەدەسـتیەوە ببینێ ماڵو سامان بەدەستدەهێنێت.

**کاڵەك**: (ئیبن سـیرین) دەڵێت: کاڵـەك نەخۆشییە ، هەروەها دەڵێن: پیـاوێکی لەش بەبارو نەخۆشە، هەروەها دەڵـێن: ئەگەر کاڵـەك بهێنـێ خـەمو پەژارەیـەك رووی تێـدەکات بەبێئـەوەی بزانێـت لـەکوێوە سـەریگرتووە، هـەروەها دەڵـێن: کاڵەکـە سـەوزەی نەگـەیوو تەندروستیو لاشەیە.

*ئـەوەی ببینـێ دەسـتی بـۆ ئاسمـان درێژکردووە کاڵەکێك دەگرێتەوە موڵكو دەسـتەلاتێك داوا دەکـاتو بـەخێرایی دەستیدەکەوێت.

*دەگێڕنـەوە پیاوێـك کاڵـەکیان گرتـە ماڵەکـەی، خەوەکـەی بـۆ خەولێکدەرەوەیـەك گێڕایـەوە ئـەویش پێـی وت: هـەر کاڵـەکێك کـەتێیان **گرتووی کەسێکی ماڵەکەت دەبرێت.**

***کاڵەکی سـەوزی هنـدی پیـاوێکی روح قورسی ساردو سڕە لەدیدی خەڵکیدا.**

(نابلسی) دەڵێت: ئەوەی ببینـێ کاڵـەك دەخوات لەزیندان قوتار دەبێـت بـەپێی ئایـەتی: ﴿فَابْعَثُوا أَحَدَكُمْ بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ الَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنْظُـر أَيُّهَـا أَزْكَـى طَعَامَـاً فَلْيَـأْتِكُمْ بِـرِزْقٍ مِنْـهُ﴾ (الكهـف:١٩) بەواتای کاڵەك هاتووە.

*ئـەوەی ببینـێ کاڵـەکی هنـدی دەدات بەخـەڵکی سـووكو سـارد دەبێـت لەبەرچاوی خەڵکیدا یان قسەی قورسو گراندەکات .

*ئەوەی بیەوێت ئیشوکاربکات کاڵەکی خراپ بەڵگەیە لەسەر بێئیشی.

*کاڵەکی سەوز شارۆچـکە یـان کـوڕ یـا ژنە یان سـەری هاوڕێیـە ، ئەگـەر چـوە لای نـەخۆش چارەسـەر وەردەگـرێ ئەگـەر پێویـستی پێنـەبوو بەڵگەیـە لەسەر نەخۆشی.

*کاڵەکی زەردیش پیـاوو ژنـە کەباسـی چـاكو باشـیان هەیـە، دەگونجێـت بەڵگەبێت لەسەر ژنی خانـەدانو جـوان لەگەڵ کەمو کوڕی رەقو ئیشی زبر یان لەسەر رەقی.

*ئەگەر كاڵەكێكی لەتكراوی بینی بەڵگەیە لەسەر قەرزێك دەیدەنەوە یان لەچەن مانگیدا قەرزیدەكات.

*كاڵەكی سووریش بەڵگەیە لەسەر جۆرەكانی خشڵو ئاڵتوون.

**كاڵەك فرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیاوی لەش بەبارو نەخۆشو بەڵگەشە لەسەر ئەوەی چارەسەرو شیفای نەخۆشی لایە لەگەل رزقو رۆزی فراوان.

**كامخ**[1]**:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا غەمو پەژارەو كێشمەكێشو ناكۆكییە، ئەگەر لێیخوارد غەمو پەژارە رووی تێدەكات ، ئەگەر لێی نەخواردو دەستی لێنەدا ماڵو سامانێكە زیانی لێدەكات.

**كامخ فرۆش:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاوێكە فرەنەخۆشو دەردەدارە.

**كانزاكان:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: كانزاكانی نێوزەوی بەڵگەیە لەسەر:

+گەنجینە.

+ماڵوسامانی هەڵگیراو.

+زانیاری شاراوە.

+كاروباری نهێنی.

[1] **كامخ:** ئەوەی لەخواردندا بەكاردێت بۆ تامو چێژتێكردنی . (فەرهەنگی دەریا: ٢/١٠٢٣).

*ئەگەر كانزایەك یان چەند كانزایەكی دییەوە تەماشای حاڵوباریدەكرێ ئەگەر كشتیاربوو بژێوی پەیداكردنی دەژێتەوە، ئەگەر زانستپەروەربوو بەدەستیدەهێنێتو سەركەوتوو دەبێت.

*ئەگەر ئەوكانزایانەی لەخەودا بۆ خەڵكی حەلاڵكرد بەڵگەیە لەسەر ئەو زانیارییەی بەدەردەكەوێ، ئەگەر دەستەلاتداربوو لەدەریای دوژمندا یاخود بەتێكۆشان ناسرابوو چەندین شاری هاوەڵ پەیداكەران ئازادكارو دەستكەوتیان دەبێت، ئەگەر بیدعەچییەكی گەورەبوو فیتنەیە بۆیو بەرووی خەڵكیدا ئاوەلایدەكات.

*كانزاكانی نێو زەوی ماڵوسامانی بێدەنگە وەك چاو پارێزراوە.

**كاولبوون ( فەوتان - تیاچوون ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پووچەڵبوونەوەی سوودو قازانجە یاخود نەبوونی نەرمونیانییە بەهۆی نەخۆشییەوە یان دوورینەوە یاخود ئافەتو بەلابارین بەسەر كشتوكاڵ یان هاتنی نەهامەتی بەسەر ئاژەلاندا.

*لای خەڵكی رێبازدار بوونو مانەوەیە.

ك ت

**كـتري**: (ئـيبن سـيرين) دەڵێـت: رێـزو پلەوپایە نرخی ماڵە.

*ئەگـەر ئـاگرێکی کـردەوەو کترییـەکی خستەسەری‌و گۆشتی تێکرد یان خوارد پیاوێك دەجـووڵێنیٚ بـۆ بەدەسـتهێنانی سوودو قازانج، ئەگـەر بینـی گۆشـتەکە کوڵاوخـــواردی ســـوودو قـــازانجی لێـوەردەگری‌و مـاڵ‌و سـامانی حـەلاڵ بەدەســـتدەهێنیٚ،ئەگەر نـــەکولابوو سوودی حەرامە.

*ئەگـەر گۆشـت‌و خـواردنی تێدانـەبوو پیـاوێکی هـەژار رادەسـپێریٚ بـەکارێك لەتوانایدا نییەو سوودی لێوەرناگریٚ.

*کتری شووشە پیاوێکە نـازو نیعمـەتی خۆی بۆ سەرجەم خەڵکی دەردەخـات‌و بەتایبەتیش بۆ دراوسێکانی.

**کتێـب( پـەرتووك )**: (ئـیبن سـیرین) دەڵێت: کتێـب هێـزە، ئەگـەر کتێبێکـی بینـی هێـز بەدەسـتدەهێنیٚ بـەپێی ئایەتی: ﴿يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ﴾ (مريم: ١٢).

*کتێـب خێرێکـی بەناوبانگـە ئەگــەر بلاوکرابووەوە ئەگەر داخرابـوو خێرێکـی شاراوەیە.

*ئەگەر کتێبەکە لەدەسـتی منداڵـدابوو مژدەیـە، ئەگـەر لەدەسـتی کـچێکدابوو خێرو مژدەو خۆشییە، ئەگەر لەدەستی ژنێکـــدابوو پـــەیبردن بەکارێکـــە لەخۆشیدا.

*ئەگـــەر کتبێکـــی داخـــراوی بەدەستییەوە بینی زوو دەمریٚ بـەپێی ئایـەتی: ﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ﴾ (الأنبياء: ١٠٤).

*ئەگـــەر بینـــی بـــەبلاوکراوەیی لەپێـشەوای وەرگـــرت دەســـتەلات‌و ســـەرکەوتن‌و نـــازو نیعمـــەت بەدەســـتدەهێنیٚ ئەگـــەر بـــەئارامبوو، وەگـــەرنا لەکۆیلایـــەتی‌و ملکەچـــی دەترسیٚ.

*ئەگەر بینی کتێبێکی داخراوی نارد بۆ مرۆڤێـك‌و پاشـان بۆینـاردەوە، ئەگـەر دەسـتەلاتداربوو بەسـوپایەکەوە رووی تێکـرد دەدۆڕێـن، ئەگـەر بازرگـانبوو لەبازرگانیەکەیدا زەرەر دەکات، ئەگەر ژنی دەستنیشانکردبوو پێناگـات‌و وازی لێدەهێنیٚ.

*ئەگەر کتێبێکی بەدەستی راستییەوە بینـی خێـرە، ئەگـەر شـەڕو ئـاژاوەی هەبوو لەگەڵ مرۆڤێکدا یـاخود گومـانی هـەبوو بەئاشـکرا بـۆی روونـدەبێتـەوە، ئەگەر لەسزاو ئێش‌و ئازاردابوو خۆشی‌و شادی رووی تێدەکات بـەپێی ئایـەتی : ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ

شَيۡءٖ وَهُدٗى ﴾ (النحل: ٨٩) ئەگەر غەمباربوو یان ئاوارە کاروباری بۆ ئاساندەبێو بەدڵخۆشییەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای خانەوادەکەی.

*وەرگرتنی کتێب بەدەستی ڕاست خێرە.

*ئەگەر بەدەستی چەپ کتێبێکی وەرگرت پەشیماندەبێتەوە لەکارێك ئەنجامیداوە.

*ئەگەر کتێبێکی لەمرۆڤێك وەرگرت ڕێزدارترین شت وەردەگرێ لای بەپێی ئایەتی: ﴿ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ﴾ (الحاقة: ٤٥).

*ئەگەر بێباوەڕێك قورئانێکی بەدەستیەوە بینی یان کتێبێکی عەرەبی ملکەچدەبێ یان دەکەوێتە بۆتەی غەمو پەژارەو بەلاو نەهامەتییەوە.

*ئەگەر تەماشای لاپەڕەو گۆڤارێکیکرد بەلام ئەوەی تێدابوو نەیخوێندەوە میراتیەو بەدەستیدەهێنێت.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی کتێبێکی دڕاند غەمو پەژارەکانی دەڕەوێنەوەو فیتنەو شەڕی لێدەکەوێتەوەو خێری دەستگیردەبێ.

*ئەگەر بینی کتێبێکی مۆرکراوی بۆهات ملکەچو رامی فەرمانڕەوایەکدەبێ بەڵگەش لەسەری چیرۆکەکەی (سولەیمان) پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێبێت) لەگەڵ (بەلقیس)دا.

*ئەگەر لاپەڕەو گۆڤارێکیان بۆ ناردو تێدا پارچەیەکی لۆچکراوی تێدابوو کچێکەو هاوسەرگیری لەگەڵ دەکاتو دووگیاندەبێ.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی کتێبێك دەنووسێ کاروکاسبییەکی حەرام ئەنجامدەدات بەپێی ئایەتی: ﴿فَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ ﴾ (البقرة: ٧٩).

*نەخشو نیگاری دەستی پیاو فڕوفێڵە ملکەچیو ڕسوایی بەدوادا دێت، بۆ ژنانیش فرویڵو پارە پەیداکردنە.

*ئەگەر بینی ئایەتێکی قورئان لەسەر کراسەکەی نوسراوە پیاوێکی پابەندە بەقورئانەوە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر نامەی کردارەکانی بەدەستی چەپ بینی پەشیماندەبێتەوە لەسەر کارێك ئەنجامیداوە. وەرگرتنی نامەی کردارەکان بەڕاست ساڵێکی پڕ فەرپیتە، وەرگرتنی لەمرۆڤێك پیرۆزترین شتی لێوەردەگرێ، لەلایەن خۆیەوە.

*ئەگەر بێباوەڕێك قورئان یان كتێبێكی عەرەبی بەدەستی خۆیەوە بینی ملكەچدەبێ‌و دەكەوێتە نێو غەم‌و پەژارەو بەلاو نەهامەتیەوە، مۆركردن دڵنیابوونە لەوكارە.

*ئەگەر كتێبێكی بینی بەسپێتی لەلایەن كەسێكی نادیارو ئاوارەوە پێی گەیشت هەواڵی نامێنێ‌و دواییدێت.

*ئەگەر كتێبێكی بینی لەئاسمانەوە دابەزی بۆی بەپێی ئەوەی حاڵیدەبوو لێی یان كەوتە نێو ویژدانی، ئەگەر خێربوو یان شەڕ.

*دەگونجێت كتێب بەڵگەبێت لەسەر یەكێك خۆش دانیشتن‌و مەجلیس بێت.

*كتێبی بەرگدار ئەگەر نەیزانی چی تێدایە بینینی بەڵگەیە لەسەر ناپاكی‌و غەش لەپیشەسازیداو مامەڵەی نادیار یان ژنی زماندرێژە.

**كتێبفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خاڵیبوونەوە لەغەم‌و پەژارەو چارەسەری گیروگرفت‌و كەوتن بەسەر هەواڵی سەیرو هاوسەرگیری بۆ رەبەن‌و تەوبە بۆ خراپەكارو موسوڵمانبوونی بێباوەڕ.

**ك ج**

**كج:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا قورسی‌و گرانییە بۆ خاوەن پلەوپایە، هەروەك چۆن ژن دەرووی خێرە بۆ ئەوانەی لەناڕەحەتیدان.

**كچۆڵەی گۆرانیبێژ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گۆرانی‌و مۆسیقا لەشاییدا هەمووی بەلاو نەهامەتییە بۆ دانیشتوانی ئەو ماڵە.

**كچی شەقڵ‌و مۆر نەشكاو:** (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی لەخەودا كچێك بینێ قورسی‌و گرانیە بۆخاوەن پلەوپایە هەروەك چۆن ژن دەرووكردنەوەیە بۆ ئەوانەی لەتەنگانەدان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+حوشتر.

+زەوییەكی بەسوودو خانوویەكی تازەبیناكراو.

+بەروبوومی نەچنراو.

+ناڕەحەتی‌و مەینەت.

+كاری ئەستەم‌و گران.

*بۆ پادشاو فەرمانڕەوا بەڵگەیە لەسەر قەلا.

*ئەوەی ببینێ دەچێتە لای كچێك دەبێت بەخاوەنی كێڵگەیەك یان بازرگانیەكی بەسوود ئەنجامدەدات.

**ك ر**

**كراس:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: كراس حاڵ‌و باری مرۆڤە لەبژێوی پەیداكردن‌و

ئاینداریدا، ئەو زیادو کەمییەی تێدا بەدیدەکات دەگەڕێتەوە بۆ خۆی.

*هەروەها دەڵێن: کراس مژدەیە بەپێی ئایەتی: ﴿ اذْهَبُوا بِقَمِيصِي هَـٰذَا ﴾ (یوسف: ٩٣).

*هەروەها دەڵێن: بۆ پیاو ژنەو بۆ ژن مێردە بەپێی ئایەتی: ﴿ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ ﴾ (البقرة:١٨٧).

*ئەگەر بینی جلەکانی هەڵتەقا لەژنەکەی جیادەبێتەوە.

*ئەگەر بینی کراسێکی بێگیرفانی لەبەرکرد باشی حاڵو باریەتی لەئایندا، مەگەر ماڵو سامانی نەبێتو نەتوانێ کارو کردار ئەنجامبدات.

*ئەگەر گیرفانی کراسەکەی دڕابوو بەڵگەی هەژارییەتی.

*ئەگەر بینی چەند کراسێکی زۆری هەیە بەڵگەیە لەسەر خێرو چاکەی زۆر کەپێیدەگات لەقیامەتداو پاداشتدەدرێتەوە.

*کراسی سپی ئاینو خێرە، پۆشینی ئەو جۆرە کراسە پلەوپایەیە بۆ خاوەنەکەی، هەروەها جبەش بەو چەشنەیەو چاکیو خراپی حاڵی پۆشەری دەردەخات.

*ئەگەر ژنێك بینی کراسێکی پۆشیو لووسو گوشادبوو باشی حاڵو باریەتی لەئاینو دنیاو حاڵی هاوسەرەکەیەوە.

*پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: "بینیم خەڵکی دەخرانە روو لامو هەبوو کراسەکەی تاسەر مەمکی بوو هەیشبوو خوارتر ، ئنجا(عومەر)م بینی کراسێکی لەبەردابوو رایدەکێشا" وتیان: بەچی لێکیدەدەیتەوە ئەی پێغەمبەر (ﷺ)؟ فەرمووی: ئاین"[1].

(نابلسی) دەڵێت: کراسی سپی ئاینە، ئەگەر بینی کراسێکی بەدیاری پێدرا خێروچاکەیە بۆی.

*ئەگەر بینی کراسەکەی دڕاوو پیسە غەمو پەژارەو بەڵاو نەهامەتییە تووشیدەبێ.

*کراسی سەوز بەڵگەیە لەسەر ئاینو هی سپیش بەهەمان شێوەو کراسی شین باش نییە.

*کراسی سوور بەڵگەیە لەسەر ناوبانگ.

*کراسی زەرد نەخۆشییە.

*تەڕی جلوبەرگ بەڵگەیە لەسەر کۆسپو رێگر لەسەفەرکردندا ئەگەر

---

[1] متفق علیه (بوخاری) /٢٣و (موسلم) : (١٨٥٩/١٥/٣).

ئــەو تەراپییەوشــكبوەوە كۆســپەو لادەچێ.

*ئەگـەر بینـی كراسـێكی بێگیرفـانو ملوانی لەبەركردو بۆینباخی نەبەست بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*ئەگەر بینی كراسێكی خـەت خـەتی لەبەركرد (حەج) یا سەفەر دەكات.

*ئەگـەر بینـی كراسـێكی كـورتی لەبەركردو عەورەتی دانەپۆشی لەگەڵ هـەردوو ئـەژنۆی لەئاینەكەیـدا كەموكوڕی دەنوێنێ.

*ئەگـەر بینـی كراسـێكی لـەدار دروستكرد بـەدەریادا سـەفەردەكاتو سـواری كەشـتی دەبێـتو ئەگـەر نەخۆشبوو مەترسی مردنیدەبێت.

*ئەگەر لەسـەر كراسـەكەی ئایـەتێكی قورئـانی بینـی نووسـرابوو پابەنـدی قورئاندەبێ.

*كراسـی بۆیـەو خـومكراو بـەڕەش بەڵگەیە لەسەر غەمو پـەژارە بۆنـەوەی لەبەریدەكات.

*ئەگەر بینی كراسێكی هەڵگەڕاوەی لەبـەركرد حـاڵو بـاری دەگـۆڕێ بـۆ واژووی خووسروشـــتی خـــۆیو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چوونە لای خێزانەكەی لەدواوە.

*دەگونجێـت كـراس مـاڵو لانـەی پیاوبێت چونكە مـەردوم دادەپۆشـێو چوارلای هەیە وەك ماڵو لانە.

*ئەگـەر بینـی كراسـەكەی لـەباری درێژیـدا دڕاوە دەرووی لێدەكرێتـەوە، ئەگـەر لـەباری پانیـدا دڕا قـسەو وتـە لەسەر ئابڕووی دەكرێ.

*ئەگەر بینی كراسەكەی لەدواوە دڕاوە دەربـارەی ئـابڕووی وتـەو قـسەدەكرێ لەكاتێكدا خـۆی بێتـاوانو پاكـە ئەگـەر لەپێشەوە دڕا قسەیەو دەربارەیكراوە.

*ئەگەر بینی كراسەكەی لەهەورە نـازو نیعمەت دەیگرێتەوە.

*بینینـی كراسـی (یوسـف) (سـەلامی خـوای لێبێت) پەیامبـەرێكی خێـر رووی تێدەكات.

**كردنەوەی قفڵ:** (ئیبن سیرین) دەڵێـت: ئــەوەی قفڵێــك دەكاتــەوە ئەگــەر رەبــەنبوو هاوســەردەگرێو قفــڵ هاوسەرە.

*ئەگــەر زیندانیــەك بینــی بــەدوعا قوتــاردەبێو خوداوەنــد دەفــەرموێ: ﴿إِن تَسْتَفْتِحُوا فَقَدْ جَاءَكُمُ الْفَتْحُ﴾ (الأنفال:١٩) واتە: ئەگـەر دوعـا بكـەن سەركەوتوو دەبن.

*ئەگـەر لەكێـشەو بەربەرەكانیـدابێت سەردەكەوێتو بڕیـاردەدات خوداوەنـد

دەفەرموێ: ﴿ انَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُبِيناً﴾ (الفتح: ).
*ئەگەر هەزارو رزق و رۆزی سواربوو دەروازەی خێری لێدەکرێتەوە لەسەر دەستی هاوسەر یان شەریك یا لەسەفەرێكدا.
*ئەگەر دادوەربوو نەیتوانی بڕیاربدات یاخود پرسیارکاربوو فەتوای بۆنەدەدرا ئەوەی بوە بەکۆسپ و رێگر بۆیدەردەکەوێ.

**کردنەوەی قفڵ و شوێنی داخراو:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئاسانبوونی کاری قورس وگران و ئاسانکردنی رزق و رۆزی.

**کردنەوەی گرێ:** (نابلسی)دەڵێت: کردنەوەی گرێ یاخود شیتەڵی لەش و لارێکی تۆکمەو توند بەڵگەیە لەسەر رزق و رۆزیو ئاسانکردنی ئەوەی ترسی هەیە قورس و گرانبێت، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پووچەڵکردنەوەی سیحرو جادوو.

**کرم:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کرم لەسکدا ئەو منداڵە خۆرانەن کەحاڵ و باریان شێواندوەو کرمی ئاوریشم بەردەستەکانی فەرمانڕەوان.
(نابلسی) دەڵێت: ئەو کرمانەی بژێوی و رزق و رۆزییان لەش و لاری مرۆڤە بەهەمان شێوازە ، هەروەها ئەو کرمانەش گۆشتدەخۆن یاخود ئەوانەی نایخۆن ، ئەگەر ببینی رووی تێدەکەن و تێکەڵ بەلەش و لاری نابن.
*ئەگەر کۆمەڵێ کرمی بینی لەپاشیەوە دێتە دەرەوە منداڵی منداڵەکانیەتی.
*ئەگەر بینی کرم لەزاری دێتەدەرەوە خانەوادەکەی دەیانەوێت دەستی ببڕن و فێڵی لێبکەن خۆشی دەزانێت و لەو فرۆفێڵە قوتار دەبێت بەسەرکەوتوویی و لەبەخێوکردنیان دەردەچێت.
*ئەگەر بینی کرم لەسکی دێتە دەرەوە بەبێ دەست و ویست خۆی لەکۆمەڵێکی شەڕەنگێز دووردەکەوێتەوە بەمەش رێزو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت.
*هاتنەدەرەوەی کرم لەلاشە رەواندنەوەی غەم و پەژارەیە چونکە زیانە، هەروەها زوخم و کێمیش رەوینەوەی غەم و پەژارەیە یاخود ماڵ و دارایی تیاچوونە.
*کرم دوژمنی خزم و ناسراوە، هەروەها دەڵێن: کرمی ئاوریشم کرپاری بازرگانەو پیشەی پیشەوەرە، بەدەستهێنانی سوودو قازانجە.

*هەروەها دەڵێن: کرمی ئاوریشم بەڵگەیە لەسەر حەرام‌و ڕوودانی حاڵ‌و بارێکی بێداری.

**کرمۆکە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا جل‌وبەرگ یان هاوسەرێکی ناشایستەیە.

**کرمی دارەمەیت:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی بەڕێز، ئەوەی ببینێ هەمووی دەکەوێتە خوارەوە زانایانی ئەو وڵاتە دەمرن، ئەوەی ببینێ‌و لەگەڵیدابێت هاوڕێیەتی مرۆڤێکدەکات یان کوڕێکیدەبێت یا هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکدەکات.

**کرمی سووری ڕەشبەڵەك:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی‌و کردارەکانیشی گەندەڵ‌و پیسبوون خراپدەبێت بۆی‌و ئەوەشی حاڵ‌وباری نادیاربێت بەڵگەی خێروچاکەیە بۆ وردەواڵە فرۆش‌و خەڵکیتر بەڵگەیە لەسەر خۆشی‌و شادی.

**کرمی سەوزی درەخت:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکە خۆی بەئاینداری خۆی دەنوێنێ‌و دەچێتە نێو ماڵ‌و سامانی سەرکردەو بازرگانەکان‌و کەم کەم دەیدزێ‌و گرنگی بەوە دەدات بەڕووخسار.

**کرمی شوێنە تەڕەکان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کرمی شوێنە تەڕەکانی وەك حەمام دوژمنێکی لاوازە.

**کرێ( مزە ):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر توشبوون بەغەم‌و پەژارەو ناسۆریی‌و چاوبڕینە دەستی خەڵکی، ئەگەر شتی ونبووی کۆکردەوە یان کارێکی ئەنجامدا کرێی بەپێویست دەگیرا بەڵگەیە لەسەر وەفاو بەسەربردنی ئەو پەیمانەی کەداویەتی‌و پاراستنی خۆشەویستی‌و بەدەستهێنانی ئەجرو پاداشت.

## ك ڕ

**کڕاو:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ناچارە، ئەگەر بینی شتێکی کڕی یان فرۆشتی ناچارەو پێویستی هەیە چونکە مرۆڤ نافرۆشرێ مەگەر لەناچاریدا بۆشتێك.

**کڕنووشی قورئا نخوێندن:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا کڕنووشی برد لەدوای خوێندنی ئایەتی کڕنووش لەسوورەتی(الاعراف)دا پارێزگاریدەکات بەفەرمانکردن بەچاکەو ڕێگری لەخراپەو پلەوپایەیەکی بەرزو بڵندی دەبێت.

*ئەگەر لەدوای ئایەتی کڕنووشی سوورەتی (رعد) کڕنووشیبرد بەڵگەیە

لەسەر ڕێزگرتن و گوێڕایەڵی و هەواڵی ڕاست و دروست.

*ئەگەر لەدوای ئایەتی کڕنووشی سوورەتی (اسراء) کڕنووشیبرد لەترسی خوداوەند زۆر دەگری و ملکەچی بۆ دروستدەبێ.

*ئەگەر لەدوای ئایەتی کڕنووشی سوورەتی (مریم) کڕنووشیبرد ئەوە بەڵگەیە لەسەر نیعمەت و خۆشگوزەرانی و بەرزکردنەوەی پلەوپایە لەدنیاو قیامەتدا مەگەر بۆئەوەی لەپلەوپایەدا دەبێت بەجێنشینی ناتوانێت ڕۆڵی ئەو ببینێ لەکوڕو میراتگر.

*ئەگەر لەدوای ئایەتی کڕنووشی سوورەتی (الحج)(کڕنووشی یەکەم) کڕنووشیبرد بەڵگەیە لەسەر ئامۆژگاری و ناخۆشی و نیگەرانی بەهۆی ئەو حاڵەوە کەلەسەریەتی، ئەگەر لەدوای ئایەتی دووەمی(حەج) کڕنووشیبرد بەڵگەیە لەسەر هاندان لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەچاکەو ڕێگری لەخراپە.

*ئەگەر کڕنووشی برد دوای خوێندنی ئایەتی کڕنووش لەسوورەتی (فرقان)بەڵگەیە لەسەر دەرچوون و لادان لەگوێڕایەڵی و دەستدانە سەرپێچی، یاخود ئەگەر ئەوەی خەوەکەی بینی قاچی هەڵخلیسکابوو بەڵگەیە لەسەر گومانی باشبردن بەپەروەردگارو بیرو باوەڕی باش.

*ئەگەر دوای خوێندنی ئایەتی کڕنووشی سوورەتی (نمل)کڕنووشیبردو ناوبانگی بەرز لای بیدعەکاران و قسە ڕۆیشتن لای پادشایان و ڕاستگۆی لەلایان و گواستنەوەی قسەی خراپ و ناقۆلا.

*ئەگەر دوای خوێندنی ئایەتی کڕنووشی سوورەتی (السجدة) کڕنووشی برد بەڵگەیە لەسەر باوەڕهێنان بەخواو دڵنیابوون و خوازیاربوونی ڕێزو شکۆی خوایی و تەوبەو پارێزگاریکردن لەنوێژ.

*ئەگەر دوای خوێندنی ئایەتی کڕنووش لەسوورەتی (فصلت) کڕنووشیبرد بەڵگەیە لەسەربەجێهێنانی فەرمانەکانی پەروەردگار بەگوێڕایەڵی بۆ پەرپرس و سەرکردە.

*ئەگەر لەدوای خوێندنی ئایەتی کڕنووش لەسوورەتی(النجم) کڕنووشیبرد بەڵگەیە لەسەر تەوبەکردن لەگوناهو تاوان و خۆگرتن لەوکارانەی نکوولی لێکراوە.

*ئەگــەر لــەدوای خوێنــدنی ئایــەتی کڕنــووش لەســوورەتی (الانــشقاق) کڕنووشیبرد بەڵگەیە لەسەر ترساندنو تەمێکردن لەئەنجامدانی گوناهو تاوان.

*ئەگــەر لــەدوای خوێنــدنی ئایــەتی کڕنــــووش لەســــوورەتی (اقــــرأ) کڕنووشــیبرد بەڵگەیــە لەســەر تەوبــەو پەشــیمان لــەگوناهو تــاوان کــرداری خــراپو ئــەوەی مــرۆڤ شایــستەی دۆزەخدەکات.

**کڕنووشــی سوپاســگوزاری:** (نابلــسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیــە لەســەر بــەلاو نەهامەتیو نوێکردنــەوەی رزقو رۆزیو پاداشتدانەوەی خەوبینەر بۆ رەنجدەرو ماندووی ئەو کارە.

*ئەگـەر کڕنووشــی سوپاســگوزاری بــۆ خوداوەنـد بـردو خـۆی پیروبرینـداربوو بــەڵام پــشتی نەچــەمابوەوە بــەماڵو بەخششێك بــەهێز دەبــیو دەوڵەمەنـد دەبێت بەدروستی.

**کڕنووشــی نوێــژەکان:** (ئــیبن ســیرین) دەڵێــت: کڕنــووش لەخــەودا بەڵگــەی ســــەرکەوتنو تەوبەیــــە لــــەگوناهێك ئەنجامیــــداوە، هــــەروەها بەڵگــــەی بەدەســــتهێنانی مــــاڵو دارایــــیو تەمەندرێژییــــە ، هــــەروەها بەڵگــــەی

قوتاربوونــــە لەناڕەحــــەتیو بــــەلاو نەهامەتی.

*ئەگــــەر بینــــی کڕنووشــــدەبات بــــۆ خوداوەنــد لەســــەر چــیایەك زەفــــەر بەپیاوێکی تۆکمەو بەهێز دەبات.

*ئەگەر کڕنووشی برد بۆ بەدەر لەخودا پێداویــــــستیەکەی بەجێنایــــــەتو شکــستدەهێنی ئەگــەر لەجەنگدابێتو زەرەر دەکات ئەگەر بازرگانبێت.

(نابلــــسی) دەڵێــــت: ئەگــــەر بینــــی کڕنووشــیبردو نوێــژیکرد بــۆ خوداوەنـد ملکەچدەبێت بۆیو لەخۆبەگەورەزانین قوتــاردەبیو ســنوورەکانی خوداوەنــد دەپــارێزیو ئەرکــەکان بەجێــدەهێنیو نوێــژ زۆردەکــاتو بەخواســتی دنیــاو قیامەتیــدەگات بەشــێوەیەکی خێــراو بەســـەر دوژمنەکانیــدا زاڵو ســەرکەوتوو دەبێت.

*ئەگەر بەسەر گردۆڵکەو بەرزاییەکەوە کڕنووشــیبرد یــان بەســەر دیوارێکــەوە ملکەچــدەبێ بــۆ پیــاوێکی شــکۆمەندو باڵاو رسوایدەکات.

*کڕنووشبردن لەخەودا بەڵگەیە لەسـەر باوەڕهێنــــان بــــەخوداو تەویــــەکردن لەگوناهو تاوان.

*دەگونجێــــت بەڵگــــەبێت لەســــەر چــەمانەوەو کڕنــووش لەحەجدا بــەپێی ئایــەتی: ﴿ طَهِــرَا بَيْتِــيَ لِلطَّــائِفِينَ

والعَاكِفِينَ والرُّكعِ السُّجُود﴾ (البقرة:٢٢٥).

*دەگونجێت کڕنووشبردن بەڵگەبێت لەسەر شوێنکەوتنی سوننەتو هاوەڵایەتیکردنی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەهەشتدا.

*هەروەها کڕنووشبردن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر :

+سەرکەوتنو زاڵبوون.

+پاشگەزبوونەوە لەگوناهو تەوبەکردن.

+ماڵو دارایی دەستکەوتن بەدرێژایی تەمەن.

+قوتاربوون لەمەترسیەکان.

*هەروەها کڕنوشبردن سەرکەوتنەو چاکی کاروبارەکانە.

*دەگونجێت کڕنووشبردن نیعمەتو بەخشش بێت خوداوەند بیدات بەبەندەکانی.

*ئەگەر بینی خشتێکی زێڕ کڕنووشی برد بۆ خشتێکی زیو پیاوێکی ڕێزدار ملکەچی بەردەستی پیاوێکی سووکو رسوادەبێت.

*ئەگەر کڕنووشیبرد بۆ خاچ (صليب) ملکەچی کۆمەڵێکی دووڕوو دەبێت لەگۆرانیو لێدانی ئامێردا.

**ك ش**

**کشانو ڕوویەدوژمن چوون:** بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو دڵسۆزی لەزانیاری ماڵو دارایيدا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆئامادەکردن بۆ (حەج) یان ئامادەبوون تێیدا.

*ئەگەر خۆیکشا روو بەدوژمن روحو ماڵی دەخاتە مەترسییەوە روو بەچارەنووسێکی ئەستەمو گراندەچێت.

**کشتوکاڵ:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا کشتوکاڵێکدەکات ژنەکەی دووگیاندەبێت.

*ئەگەر بینی لەخاکی یەکێکیتردا کشتوکاڵدەکات لەنێوان خۆیو خاوەنی ئەو زەوییەدا جەنگ بەرپادەبێتو کشتوکاڵەکە دەسووتێو برسێتیو نەبوونی بڵاودەبێتەوە.

*ئەگەر بینی لەنێو کێڵگەیەکدا دێتو دەچێتو سەوزە ، لەکاری چاکەو خواناسیدا هەوڵدەداتو نازانێت لێی وەردەگیرێ یان نە.

*ئەگەر بینی لەزەوییەکدا کشتوکاڵدەکات بۆ هاوسەردار کوڕەو بۆ رەبەن هاوسەرگیرییەو بۆ خاوەن دانەوێڵە زیادەیە لەبەروبوومو پارەداو

بــــۆ دەســـــــتەڵاتدار فراوانــــــی دەستەڵاتەکەیەتی.

*ئەگـــــەر جوولەکەیـــــەك بینــــی کشتوکاڵەکەی لەکێڵگەیەکدا دەکات ئەوە دەکوژرێتو بەردەباراندەکرێ.

*کـشتوکاڵ: ســەوزییەکەی بەڵگەیـە لەسەر تەمەندرێژیو وشکیشی بەڵگەیە لەســەر نزیکبوونــەوەی چــارەنووس، چاندنی گەنم چاکەو چەندقات خێرە بۆی.

*دەگونجێــت گوڵەگــەنم بەڵگــەبێت لەســەر ناڕەحــەتی هــەروەك چــۆن گوڵەگـەنم بەڵگەیـە لەسـەر زیـادبوونی پاداشـــــتو چـــاکە، گوڵــــەجۆش هەستکردنە بەخێر.

*کـشتوکاڵ بەڵگەیــە لەســـەر کـردار، ئەگــەر بینــی لەخاکێکدایــە گونجــاوو لـــەبارە بـــۆ کـــشتوکاڵ کارێـــك ئەنجامدەدات بۆ داهاتوو ئومێدی باشی لێدەکات.

*ئەگـــەر لەشـــوێنێکدا کـــشتوکاڵی ئەنجامدا گونجاو نەبوو تێدا کشتوکاڵ بکــات نێربازیــدەکات یــاخود زینــاو داوێنپیسی.

*ئەگـەر بینـی کـشتوکاڵ لـەکاتێکیتردا دەدورێتەوە بەڵگەیە لەسەر مـردن لـەو جێگەیەدا یاخود هەڵگیرسانی جەنگ.

*ئەگەر بەنێو کشتوکاڵدا ڕۆیی بەنێو ریزی تێکۆشەراندا تێدەپەڕێت.

*ئەگەر بینی کشتوکاڵێکی ئاسای هەیە کاروکرداریەتی لەئاینو دنیادا.

*ئەگـــەر بینـــی بـــەنێو کـــشتوکاڵێکی ســـەوزدا ڕۆیـــی لـــەکاروکرداری چـــاکەدا هەوڵدەدات.

*کێڵگـــە بەڵگەیـــە لەســـەر ژن تـــۆو دەگرێتـــە خـــۆیو منداڵیـــدەبێتو، شیردەدات هەتا کاتی دورێنە.

*دەگونجێت کێڵگە بەڵگـەبێت لەسـەر گۆڕەپـــانی جـــەنگو پەلەکانیـــشی ســـەربازێتو دوورینـــەوەی بەشمـــشێر لێکبدرێتەوە.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر دنیـاو گوڵـە گەنمەکانیـشی بەڵگـەبێت لەسـەر ئاپۆڕەی خەڵکی گەورەو بچووكو پـیرو لاویان.

*دەگونجێت بەڵگـەبێت لەسـەر هـەموو شوێنو جێگەیەك تۆوی تێدا بچێنرێ بۆ قیامـەت وەك مزگـەوتو کـۆڕی زیکـرو شوێنی خێروچاکە.



**کفن**: (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بەڵگـەی ئالوودەبوونو حەزکردنە لەزینا ، ئەگەر بینی لەبەرینەکرا بانگدەکرێ بـۆ زینـا بەلام وەلام ناداتەوە.

*ئەگەر بینی لەکتێبێکەوە پێچراوە وەك مردوو بەڵگەیە لەسەر مردنی ، ئەگەر سەری دانەپۆشرا لەگەڵ قاچیدا تێکچوونی ئاینەکەیەتی.

*ئەگەر کفنەکە بەمردووەکەوە کورتبوو بەڵگەی تەوبەیەتی ، ئەگەر درێژیشبوو دوورە لەتەوبەکردنەوە.

*ئەگەر کۆمەڵێکی نادیاری بینی رازاندیانەوەو جلوبەرگی گرانبەهایان لەبەرکرد بەبێ هۆیەك وەك بوونی جەژن یان ئاهەنگ یاخود لەماڵێکدا بەتەنیا بەجێیانهێشت بەڵگەی مردنیەتی.

*جلوبەرگی نوێی سپی دیاریکردنی کاروبارەکانیەتی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا داپۆشینی عەیبو ناتەواوییە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شاردنەوەی کارەکان یاخود بۆ رەبەن بەڵگەی هاوسەرگیری بێت بەبێئەوەی بگونجێ.

## ك ل

**کل(سوورمە** (ئیبن سیرین) دەڵێن: کل ماڵو سامانە، کلدانیش ژنە ، چاوڕێژی بۆ پیاوی چاك باشەو بەپێچەوانەشەوە ، حەزلێکردنیشی کورە.

*هەروەها دەڵێن: کل بەڵگەیە لەسەر تیژیو ڕووناکی بینایی، هەروەها ئەگەر بینی چاوەکانی چارەسەر دەکات ئاینەکەی چاکدەکات.

*ئەگەر بینی چاوی دەڕێژێ ئەگەر چاوڕێژی بۆ چاککردن چاویبوو بەباشی ئاینەکەی چارەسەر دەکات، ئەگەر بۆ جوانکاریبوو لەئاینەکەیدا کارێك ئەنجامدەدات خۆی پێدەڕازێنێتەوە.

*ئەگەر کلی پێدرا ماڵو سامان بەدەستدەهێنێ.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا زیادەی ماڵو سامانو دیدی فراوانە روو بەچاکسازی.

*ئەگەر پیاوێکی باشی بینی چاوی بۆ رێژا بەڵگەیە لەسەر خێر، ئەگەر پیاوێکی رەش چاوی رەشکرد باش نییە.

*ئەگەر بینی کلی بەدەستهێنا ماڵو سامان بەدەستدەهێنێ، ئەگەر کوێربوو چارەسەریەتی.

*ئەگەر بینی چاوی بەکل رێژرا دوو ژن دەهێنێ، بەڵام ئەگەر بەکل نەبوو وەك چەوری هەرشتێکیتر دوای حەرامێك دەکەوێ لەپێشو پاشەوە.

*ئەگەر بینی چاوی مندالآن بەشتێکیتر دەرێـژن بـەدەر لـە(کـل) گاڵتـەیان پێدەکات.
*ئەگـەر مرۆڤێکـی بینـی چـاوی رێـژراو کـوێریکرد شـتێك لـەماڵو سـامانی بەفرۆفیلْدەبات.
*ئەگەر کچێك چاوی رێژرا سوودەکاتو بێوەژنیش بەهەمان چەشنو شێوازە.
*چاوڕێژتن بەخوێنو خۆڵەمێش خراپەکاریو مارەبڕینێکی پووچو بەتاڵە.
**کلدان( چاوڕێژ)** : (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر ویستی چاوی بڕێژێ ئەگەر رەبەنبوو هاوسەر دەگرێو ئەگەر هەژاربوو سوودو قازانجدەکات ، ئەگەر نەزانبوو فێردەبێت مەگەر کلەکەی خۆڵەمێش یان کەف یاخود شتێکی لەویابەتەبێ ئەوجا داوای کارێکی حەرامدەکات لەبژێویو پەیوەندی سێکسیدا.
*کلـــدان لەبنەڕەتـــدا ژنێکـــە بانگەشەدەکات بۆ چاکەکاری.
(نابلسی)دەڵێت: دەگونجێت بەڵگـەبێت لەســەر پاراســتنی نهێنــیو مــاڵی بەفیڕۆدراو.
(نابلـسی) دەڵێـت: پیاوێکـە نوێکـاری دەکاتو خوداوەند لەسەر دەستی ئەوە رێنومایی خەڵکیدەکاتو خۆشەویستان بەیەکەوە کۆدەکاتەوە.
*کلدان پیاوێکە بەڵگەیە لەسەر:
+زانیاری.
+بەرچاوڕۆشنی.
+تیژی تێڕوانین.
+مەلەوانو بیرهەڵکەندن.
+کارێز.
+چاکەکار.
+رەخنەگرانی راستەقینە.
+ئامۆژگاریدەر بۆ ئەوەی راوێژو پرسی پێدەکەن.
*هـــەروەها کلـــدان خـــاوەن هـــەواڵو دەنگوباسە.
**کلـــك**: (نابلـــسی) دەڵێـــت: لەخـــەودا شوێنکەوتەیە، ئەگەر بینی کلکی هەیـە خـەڵکێك دەبـن بەشـوێنکەوتەی ئـەو چونکە کلك بەدوای خاوەنەکەیدا دێت.
**کلیـل**:(ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: کلیـل بەڵگەیە لەسەر:
+خۆبردنەپێش لای فەرمانڕەوا.
+ماڵوسامان.
+داناییوچاکسازی.
*ئەگـــەر کلیلـــی بەهەشـــتبوو دەســتەڵاتێکی مــەزن بەدەســتدەهێنێ

لەئایندا یان لەکرداری باش یاخود گەنجینەو ماڵی حەلاڵ.

*ئەگەر کلیلی (کابە)دیار نەما دەستەلاتدارو فەرمانڕەوایەکی مەزنو بەوچەشنە دیار نامێنێ، یان ماڵوسامانە یاخود مەترسیەکی گەورەیەو گەنجینەکانە خوداوەند دەفەرموێ: ﴿لَهُ مَقَالِيدُ السَّمَاوَاتِ وَالأرْضِ﴾(الزمر: ٦٣)واتە : دەستەلاتی ئاسمانەکانو زەویو گەنجینەکانی، بەهەمان چەشن سەبارەت بە(قارون) دەفەرموێ: ﴿مَا إنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالعُصْبَةِ اولي القُوة﴾ (القصص:٧٦) باس لە ماڵو سامانو گەنجینەکانی دەکات.

*ئەگەربینی کلیلێك یان چەند کلیلێکی بەدەستهێنا دەستەلات بەدەستدەهێنێ یاخود بەئەندازەی ئەوە ماڵو دەستەلات بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەربینی دەرگایەك بەکلیل دەکاتەوە کلیلەکە دوعایە وەلام دەدرێتەوە بۆ خۆیو دایكو باوكو کەسانیتر، بەمەش داواوخوازی بەجێدێت.

*ئەگەر کلیلەکە دەرگاکەی نەکردەوە پەنادەگرێ بەکەسانیتر لەکاروباری خەڵکیتردا.

*ئەگەر ساختمانێکی لوولەئاسای بەکلیلێك کردەوە دەروویەکی مەزنی لێئاوەلادەکرێ لەگەڵ دەروازەکانی خێردا بەدوعاو پشتگیری کەسانیتر بۆی.

*قفڵ کەفیلێکی دەستەبەرە، داخستنی دەرگاش پێدانی کەفیلو دەستەبەرەیە.

*کردنەوەی قفڵ دەرووی خێرە.

*هەموو داخستنێ غەمو پەژارەیەو هەموو کردنەوەیەك دەروە.

*هەروەها قفڵکردنەوە پیاوێکی بەدەستەلاتە یان تیروپشکە.

*ئەگەربینی دەرگایەك یان قفڵێ دەکاتەوە زەفەرو سەرکەوتنی پێدەدرێ بەپێی ئایەتی: ﴿نَصرٌ مِنَ اللهِ وَفَتحٌ قَرِيب﴾(الصف: ١٣).

*کلیل دەستەلاتو ماڵو مەترسیەکی مەزنە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا رزقو رۆزیو پشتگیرییە یان کردنەوەی دەروازەی زانیاریو فێربوونی قورئانە لەغەیبەوە وەریدەگرێ بەتایبەت ئەگەر چەند کلیلێکی پێبوو رزقو رۆزیو زانیاریو پشتگیریو هۆکارەکانی بەدەستدەهێنێ.

*دەگونجێت کلیلەکان بەڵگەبن لەسەر:

+منداڵ.

+سیخوڕ.

+نوێنەر.

+هاوسەر.

+ماڵو سامان.

*دەگونجێت کلیلەکان بەڵگەبن لەسەر بەدەستهێنانی ئەوەی لەخوداوەندیدەوێت.

*بینینی کلیل بۆ پلەوپایەداران شارو ولآتانە.

*کلیل سەرکەوتنە بەسەر دوژمندا بەپێی ئایەتی: ﴿نَصۡرٞ مِّنَ اللهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞ﴾(الصف:١٣).

*ئەگەر کلیلێکی دارینی بەدەستەوە بینی ماڵو سامان لای کەسی دانانێ ئەگەر دانینا کەسەکە نکوولی لێدەکات چونکە دار دووڕوویيە.

*ئەگەر کلیلێکی بێددانی بەدەستیەوە بینی ستەم لەهەتیو دەکات.

*ئەگەر کلیل بەدەستیەوە بینی خواناسیو دنیانەویستیو زانیاریو گەنجینەو ماڵێکی حەلآلی دەستگیردەبێ.

*کلیل گەنجینەیە چونکە بەهۆیەوە دەکرێتەوە لەبەرئەوە بە(حەج) گوزارشتی لێدەکرێ.

*کلیلی ئاسن پیاوێکی بەهێزو توانایەو کاروبارەکانی بۆ ئاوەڵآدەبێ.

*ئەگەربینی دەرگایەکیکردەوە یان قفڵێك سەردەکەوێت بەسەر دوژمنەکانیدا، دەگونجێت بەیارمەتی کەسانیتر سەربکەوێت ئەگەر بەکلیلێك کردیەوە بەیارمەتی خودا ئەوەی کەدەیەوێت بەدەستیدەهێنێت، ئەگەر بەبێ کلیل کردیەوە پێداویستیەکانی بەدوعاو چاکە یان دوعای دایكو باوکی بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەربینی کلیلێك هەڵدەگرێو گەنجینەیەك بەدەستدەهێنێ یاخود ماڵو سامان لەئاژەڵدارییەوە، ئەگەر ماڵو سامانداربوو خوداوەند مافێکی هەیە لەماڵو سامانەکەیدا یا لەخوابترسێو مافی خودا بدات.

*ئەگەر ژنێك بینی کلیلێکیان دایە شوودەکات بەپیاوێك، ئەگەربینی ناتوانێ دەرگایەك بکاتەوە ناگات بەویستو خوازی هەتا نەیکاتەوە.

*دەگونجێت کلیل بەڵگەبێت لەسەر عەورەتی نێرینە کەدەچێت بەنێو عەورەتی مێیینە یان مردو کەدەخرێتە نێو گۆڕەکەی یان منداڵی باڵغبووە.

*کلیلی شار خاوەنداری یان فەرمانڕەواییە.

*دەگونجێت کلیل بۆ زانا بەڵگەبێت لەسەرئەوەی دەروازەکانی زانیاری پێ ئاوەلادەکات.

**ك ڵ**

**کڵاو( شەبقە ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: کـڵاو سـەفەرێکی دوورە یـان هاوسـەرگیرییە لەگـەڵ ژنێکـدا یـاخود بـەکرێگرتنی خزمەتکارێکـە، دانـانی لەسەرسەر بەدەستهێنانی دەستەلاتو خێرە لەسەرکردەیەك یاخود هێزە بۆ بەرپرسەکەی، داکەندنی جیابوونەوەیە لەبەرپرسەکەی.

*ئەگـەر بـەدڕاوی یـان پیـسی بینـی گـەورەو بەرپرسـەکەی غـەمو پـەژارەی توشـدەبێ بەئەنـدازەی ئـەوە ، ئەگـەر لاوێکی نادیار دایکەنـد لەسـەری یـاخود دەسـتەلاتدارێکی نادیـار مـەرگی بـەرپرس و گەورەکەیـەتی و جیابوونەوەیانە بەمردن یان ژیان.

*ئەگـەر کـڵاوی قەشـەیەکی بەسـەری خۆیـەوە بینـی لـەئامێزی بـەرپرس و گەورەیـدا دەژی، ئەگـەر سـپیبوو دەسـتەلات بەدەسـتدەهێنێ ئەگـەر وانەبوو رادەی ئاینپەروەرییەتی.

*ئەگـەر فەرمانڕەوایـەکی بینـی کـڵاو دەدات بەخـەڵکی دەکـرێ بەبـەرپرس بەسـەر خەڵکیـەوەو پۆسـتی دەستەلاتیاندەداتێ.

*لەسـەرکردنی کـڵاو بەهەڵەوگـەڕاوی گۆڕانی سەرۆکەکەیەتی.

*ئەگەر مێزەری ئیمام کەموکورییەکی تێدابوو کەموکورییەتی لەئیسلامدا.

*ئەگـەر لەسـەرمایا مێـزەری کردبووەسـەری وەك پیاوچـاکان خـۆی دەچوێنێ بەوانو شوێنیاندەکەوێت.

*ئەگـەر چـڵكو پیـسی بەکڵاوەکـەی خۆیەوە بینـی بەڵگەیـە لەسـەر گونـاهو تاوان کەئەنجامیداوە.

*ئەگەر ژنێك کڵاوێکی بەسەریەوە بینی هاوسەردەگرێ ئەگەر رەبەنبوو ، ئەگەر دووگیانبوو کوڕیدەبێت.

*ئەگـەر کڵاوێکـی بینـی لەپێـستی سمۆرە دروستکرابوو یان رێوی ئەگـەر بەرپرسـەکەی دەسـتەلاتداربوو سـتەمکارێکی خیانـەتکارە، ئەگـەر بازرگانبوو پیسو گەندەڵی فرۆشگایە، ئەگەر کڵاوەکە لەفەروی مەڕبوو باشە.

*پیاوێك هات بۆ لای راڤەکارێکی خەو وتـی: دوژمنێکـی شـارەزای خـۆمم دی جلوبـەرگو کڵاوێکـی رەشـی لەسـەردابوو بەسـواری گوێدرێـژێکی رەشـەوەبوو ، ئـەویش وتـی: کڵاوەڕەشـەکە بەدەسـتهێنانی

دەستەڵاتو فەرمانڕەواییە، جلوبەرگی ڕەشیش پلەوپایەیەو گوێدرێژی ڕەش خێرو دەستەڵاتە.

*دەستەسڕ خزمەتکارە ئەوەی ڕووی تێدەکات لەجوانیو پاکی خزمەتکارە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر کڵاوی بەسەری خۆیەوە بینی لەوەبوو کەلەکاتی بێداریدا دەیکردەسەری بەرپرس یان براو مامو زانایەو لەدەستەڵات بەسەربووندا چوونیەکنو حاڵی لەلای بەرپرسەکەی بەئەندازەی جوانی کڵاوو شێوەیەتی.

*ئەگەر کڵاوێکی دا بەدەستەڵاتدار پۆستی دەستەڵاتو فەرمانڕەوای وەردەگرێ.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر کڵاوی بەسەری خۆیەوە بینیو سپیبوو دەستەڵاتی پێدەدرێ.

*هەروەها کڵاو بەڵگەیە لەسەر دنیانەویستی.

**کڵاوئاسن**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: کڵاو ئاسن پیاوێکە کاروباری خەڵکی دەگرێتە دەستو هەوڵدەدات ڕێکیبخات.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر :

+دڵنیابوون لەدوژمن.

+ماڵو دارایی.

+هاوسەرو خزمەتکار.

+سەفەرو سەر.

*کڵاوی ئاسنی سپی بەڵگەیە لەسەر بەتاڵیو پووچی مێشك یان دڵنیایی لەترسو بیم ، یاخود ئێشو ئازاری سەر.

*ئەگەر کڵاوی ئاسن بەسەریەوە ببینیّ دڵنیا دەبێت لەکەمو کوڕی ماڵو دارایی.

*کڵاوئاسن ئەگەر بەنرخو بەهابوو بەڵگەیە لەسەر ژنێکی دەوڵەمەندی شۆخو شەنگ، ئەگەر کڵاوەکە نرخو بەهای کەمبوو بەڵگەیە لەسەر ژنێکی ناشیرینو نابووت.

*ئەگەر کڵاوێکی ئاسنی بەسەریەوە بینی دەگات بەهۆکارو مەرامێکی گەورەو مەزن.

*کڵاوی ئاسن بەڵگەیە لەسەر گەورەو سەرۆکێك خراپەو زیان دووردەخاتەوە بۆ یەکێك بیپۆشیّ، لەدەستەڵاتیشدا دەستەڵاتدارییەو بۆ ڕەبەنیش ژنێکی خاوەن تواناو هەیبەتو شکۆمەند.

**کڵاوساز**:(نابلسی) دەڵێت: کەسێکی پلەوپایەو دەستەڵاتدارە بەئەندازەی ئەوەی کڵاودەکاتەسەری خەڵکی

چونكه كڵاو لەلێكدانەوەدا گەورەی خاوەنەكەیەتی.

**كڵاوكورە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا منداڵێكی بچووكە.

**كڵاوی قووچ:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+سەفەر.

+هاوسەری دووگیان.

+پیاوێك ئەركی ژن لەئەستۆیدابێت.

**كڵۆم( كلیل ):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا كرێگرتەی خراپی چەوساوەی كەشتییە، كڵۆمی دار داخستنی فرۆفێڵە.

*ئەگەر دەرگاكەی بینی داخرابوو لەكاروبارەكانی دنیادا كاری پێناكرێ ، ئەگەر كڵۆمی نەبوو لەكاروبارەكانی دنیادا ناتوانێ كارەكانی رێكبخات.

*ئەگەر ویستی دەرگاكەی دابخات و دانەخرێ بۆی رێگەی لێدەگیرێ لەكارێك ناتوانێت بەجێی بهێنێت.

*ئەگەربینی جەنگاوەرەو دەرگایەكیكردەوە قەلایەك كوندەكات یاخود ئاوەلایدەكات و خێری بۆ دەخرێتەسەرپشت لەلایەن پیاو یان ژنێكەوە.

*كڵۆم سەنگەرو حەشامگەیە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر كورپیان هاوسەر یاخود ئاژەڵی هێواش و سست.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دڵنیایی لەترس و بیم و خۆپاراستن لەدوژمنان یاخود ماڵی شاراوە یان مردووە لەگۆڕستانەكەی.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر جادوو نهێنی شاردنەوەو وازهێنان لەسەفەر.

*ئەگەر كڵۆمێكی بینی بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی ئەگەر هەژاربوو و شكۆمەندییە ئەگەر ملكەچ و لاوازبوو.

## ك ن

**كنافە**[1]: (نابلسی) دەڵێ: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زانیاری و رێنومایی.

## ك و

**كوانوو( ئاگردان ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گەورەی خزمەتكارێكە خاوەنەكەی نەوازش و پیاهەڵدانی لێوە بەدەستدەهێنێ.

*یەكێك لەدەستەلاتداران بینی كوانوو دانراوە لەولاتداو بەبێئاگر دووكەڵی لێبەرزدەبێتەوە، هەروەها بینی تۆو لەزەویدات دەچێنرێ، لەسەرەوە

[1] **كنافە:** جۆرە شیرینییەكە.(وەرگێڕ)

تاجەگوڵینەی هەیە، خەونەکەی بۆ راڤەکارێکی خەوگێڕایەوەو ئەویش وتی: سێ یان چوار ساڵ فەرمانڕەوایی ئەنجامدەدەیتو بەرۆبوومو فەڕۆپیت زیاددەکات لەسەردەمی تۆدا گەشتیاران زۆردەبن.

*ئەگەربینی بوو بەهەڵم سوودو قازانجو خێری دەستگیردەبێ لەبژێویدا لەگەڵ پیاهەڵدانی باش.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی کوانوەکەی کوژایەوە یاخود ناتەواوییەکی تێدا دروستبوو بیدەرە پاڵ خزمەتکار یان هاوسەرەکەی.

**کوتاڵفرۆش:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کوتاڵفرۆش پیاوێکی چاکەکارەو خەڵکی رێنوماییدەکات بۆ رێگەی راستو سوودمەندی لەدنیاو قیامەتدا، بەمەرجێك لەسەر کوتاڵەکانی پارە وەرنەگرێت، ئەگەر درهەمی وەرگرت کاری چاکە بەرووپاماییدەکات، خۆئەگەر دیناری وەرگرت ئەوا بەڵگەیە لەسەر وتیو غەرامە.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی کوتاڵفرۆش بەڵگەیە لەسەر رزقو دەوڵەمەندبوون لەدوای هەژاریو نەداری، ئەگەر خەوبینەر رەبەنبوو ژندەهێنێت.

**کوتان( لێدان ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پێکدادانو هەڵگێرساندنی ئاژاوەیە کوتەر بۆکوتراو.

(نابلسی) دەڵێت: کوتان لەخەودا بێبکەر وەك کوتانو داگرتنەوەی چیایەك وایە یان شوێنو جێگەیەك بروانێت بەسەر شوێنێکدا، هەروەها بەڵگەیە لەسەر لەناوچوونی ناویانگو شوێنەوار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەجێهێنانی پەیمانو بەڵێن.

**کورتان ـ کۆپان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەو نیشانەیە لەسەر ژنێکی عەجەمی بەدرەوشتی نارەسەن لای مێردەکەی وەك خزمەتکار وایە.

*سواربوونی پیاو بۆ کوردستان بەڵگەیە لەسەر تەوبەکردنی لەستەمو زۆرداری دوایی بەسەربردنی ماوەیەکی زۆر تێیدا.

**کورتاندروو:** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خاوەن بڕیاری یەکلاکەرەوەو رێکخەری وردی کاروبار.

*دەگونجێت بەڵگە بێت لەسەر ئێسکگرەوە یان مارەبڕ.

**کورسی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بۆ یەکێك لەسەر کورسی دابنیشێ بەڵگەیە

لەسەر بردنەوە لەقیامەتدا، وەگەرنا دەستەڵاتو بەرزیو ڕێزە بەو چەشنە.
*ئەگەر رەبەنبوو ژنێکدەهێنێت بەئەندازی جوانیو شۆخو شەنگیو بۆنەخۆش خێری تێدا نییە ، هەروەها خێر تێدانییە بۆ یەکێك لەشوێنێکی داخراودا دابنیشێ وەك زیندان یا نەخۆشخانە، بەڵام بۆ ژنێکی دووگیان باشەو دەگونجێت کوڕی ببێت یان ئەگەر لەسەرووی نەبوو یان لەپشتی تۆڕ یان کالانی شمشێرەوە کچێکی دەبێت.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی کورسیەکی بەدەستهێنا یان دانیشت لەسەری دەستەڵاتیدەبێت بەسەر ژنێکداو ژنەکەش بەئەندازەی جوانی کورسیەکەو شێوازی دەبێت، هەروەها ئەوەی روودەکاتە کورسیەکە دەدرێتە پاڵ ژنەی دراوەتە پاڵ کورسیەکە.
*کورسی ژن یان بەرزیو شکۆمەندییە لەلایەن دەستەڵاتدارەوە ، ئەگەر کورسیەکە لەداربوو هێزو توانایە لەدووڕوویداو ، ئەگەر لەئاسنبوو هێزێکی تەواوە.
*ئەگەر دانیشتبوو لەسەر کورسی وەکیل یان فەرمانڕەوا یاخود بەرپرسی منداڵ ئەگەر شایستەبێت بگەڕێتەوە بۆ لای خانەوادەکەی لەسەفەر بەپێی ئایەتی: ﴿وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ﴾ (ص: ٣٤).
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەسەر کورسیەك دانیشتوەو جلوبەرگی لەبەردایەو یان لەسەر جێگەی خەوەکەیەتی زانیارییەکی بەڕێزی دەستگیردەبێ لەگەڵ خێرێکی زۆرو شکۆمەندی.
*کورسی بۆ پلەوپایەداران بەرزیو شکۆمەندیو منداڵو هاوسەرو لانەو ماڵی خۆشو ئاژەڵو جلوبەرگە.
*ئەگەر بینی کورسیەکی بەدەستهێناو دانیشت لەسەری دەستەڵات بەدەستدەهێنێ یان ژنێك دەهێنێ بەئەندازەو شێوەی کورسیەکە.
*ئەگەر ژنێکی دووگیانیان هەبوو کوڕیدەبێو وتراویشە بەشەهیدی دەمرێ.
*ئەگەر بینی کورسیەکەی شکا بەڵگەی مردنیەتی یاخود مردنی ژنەکەی یا جیابوونەوە لێی یاخود نەمانی شکۆمەندیو پلەوپایەی.
*کورسی خۆشحاڵیو شادییە لەگەڵ پلەوپایەی خێرا بۆ یەکێك لەسەری دابنیشێ.

*بینینی كورسی خودا لەسەروو ئاسمانەكانەوەیە بۆ زانستخوازان بەڵگەیە لەسەر بەرزی پلەوپایە بەتایبەت ئەگەر لەسەر شێوەیەكی تەواو بەدیبكات، دەگونجێت بۆ دووكیان قوتاربوون بێت لەو نارەحەتیەی تێدایەو بۆ رەبەن هاوسەر بێتو بۆ هاوسەرداریش كوڕبێت.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر سەفەر بۆ كەشتیاران‌و بۆ نەخۆشیش هەڵگرتنیەتی لەسەر جێگەی مەرگ یان لەنێو ئوتومبیل‌و ئاژەڵ یاخود گواستنەوەی لەماڵ یاخود ئەو رێبازەبێت كەناوبانگی پێدەركردوە.

**كوڕ:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی كۆمەڵی منداڵێبوە خەونەكەی بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارە.

*ئەگەر بینی منداڵێكی بچووكیبوو زیادەیەكە لەدنیاو دەستكەوتدا بەدەستیدەهێنێت‌و غەم‌و پەژارە دایدەگرێ.

*ئەگەر كوڕێكی بالغی بەدەستهێنا شكۆمەندی‌و هێزەو دایكی لەلێكدانەوەدا لەپێشترە لەباوكی.

**كوژانەوە( دامركانەوە ):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ئاگرێكی كوژاندەوە فیتنەو ئاشوبێكی دامركاندوەتەوە یان جەنگ‌و بیدعەیەكی پوچەڵكردوەتەوە.

*ئەگەر ئاگرێكی هەڵگیرساوی كوژاندەوە لەخەودا دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەڵگیرسانی شەڕ بەهۆی ئەوەی لەخۆڵەمێشەوە پەیدادەبێ، ئەگەر خەوبینەر سەفەریدەكرد لەدەریاوە نوقم دەبێ‌و دەكەوێتەسەر ئاو ، ئەگەر سەفەری هەبوو دەگەڕێتەوەو هەواڵێ دەبیسترێ.

**كوشتار:** (نابلسی) دەڵێت: كوشتاری خراپەكار لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سەركەوتنی ئاین‌و پشتگیری باوك‌و دایك‌و بوونی غیرەت لەسەر هاوسەر ئەگەر ئەوكەسەبوو بەهەواداری خراپەكاران پاشگەزبوونەوەیە لەئیسلام‌و واژووبوونی ئاینە یان سەرپێچیكردنی‌و وازهێنانە لەنوێژ.

**كوشتارگە :** (نابلسی)دەڵێت: هیچ خێرێكی تێدا نییە لەخەودا بەهۆی رۆینی روحەوەو دامالینی پێستە لەلاشەو خوێنرێژی‌و بۆنی ناخۆشەوە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر بەجێهێنانی پێداویستی‌و شایی‌و شادی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لانەو ماڵی ستەمکاران‌و زینا، ئەگەر نەخۆشێك خۆی پێداکرد دەمرێ‌و میراتیەکەی دابەشدەکرێ، ئەگەر کەسێکی پاك سیسبوو بەڵگەیە لەسەر ناخۆشی‌و غەم‌و پەژارە یاخود قەرزاری.

*ئەگەر بینی بەرازی تێدا سەردەبڕێ یاخود شتێك خواردنی گونجاوی نییە بەڵگەیە لەسەر تیاچوونی ستەمکارو بیدعەکاران.

*ئەگەر خەڵکی لەدوژمنێك دەترسان سەردەکەون بەسەریا.

*کوشتارگە لانەی سزاو ستەم‌و زیندانە، ئەوەی چوەنێو کوشتارگەیەك یا وریای زیندان یان دەستگیرکردن لەلایەن پۆلیسەوە بێت.

*کوشتارگە ژنێکی دەویتە بەهۆی خرێن‌و پیسی‌و بۆنی ناخۆشەوە.

**کوشتن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی مرۆڤێکی کوشت کارێکی مەزن ئەنجامدەدات.

*هەروەها دەڵێن: قوتاربوونە لەغەم‌و پەژارە بەپێی ئایەتی: ﴿ وَقَتَلْتَ نَفْساً فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الغَمِ وَفَتَنَّاكَ فُتُوناً﴾(طه:٤٠).

*ئەگەر بینی خۆیدەکوژێت خێری دەستگیردەبێت‌و تەوبەیەکی باشدەکات بەپێی ئایەتی: ﴿ فَتُوبُوا الى بَارِئِكُم فَاقْتُلُوا أنْفُسَكُم﴾ (البقرة:٥٤).

*ئەگەر بینی کوژرا تەمەندرێژ دەبێ، ئەگەر بینی کەسێکی کوشت بەبێئەوەی سەری ببڕێت کوژراو خێری دەستگیردەبێ.

*سەربڕین بۆئەوەی گونجاونییە سەربڕێ زوڵم‌و ستەمە.

*ئەگەر بینی سەربڕاوە سەربڕ ستەم لەسەربڕاودەکات لەئاییندا یاخود گوناهو تاوان ئەنجامدەدات.

*ئەگەر کوژرا یان بەکوژراو ناوزەدکراو بکوژەکەی ناسی خێرو دەوڵەمەندی‌و دەستەلات‌و ماڵ‌و سامانی دەستگیردەبێ، دەگونجێت لەبکوژ یان لەشەریکەکەی بەدەستبهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿ وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُوماً فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِهِ سُلْطَاناً﴾.

*ئەگەر بکوژی نەناسی پیاوێکی بێباوەڕی ناسوپاسگوزارە، دەگونجێت بێباوەڕی ئاین یان نازونیعمەت بکات بەپێی ئایەتی: ﴿ قُتِلَ الإنْسَانُ مَا أكْفَرَهُ﴾ (عبس:١٧).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر کەسێکی کوشت لەغەم و پەژارە قوتاردەبێ بەپێی ئایەتی: ﴿ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ ﴾ (طه: ٤٠).

*ئەگەر بینی مرۆڤێك دەیکوژێت و ئازاری بۆ دەیکوژێ مرۆڤێکە شەریعەتی فەرامۆشکردووە.

*ئەگەر زانی خەڵکی کوشتوویەتی زەفەر بەدوژمنەکەی دەبات و سەرکەوێت بەسەر کوژانیدا.

*ئەگەر بینی پیاوێکی گۆشت و خوێن لەریخۆڵەکانی دەهات کوژراو ئێش و ئازاری بەهۆیەوە بکوژ دەستگیردەبێ: هەروەها ئەڵێن: کوژراو خێری لەبکوژ دەستگیردەبێت.

*ئەگەر مرۆڤێکی بەدەستی ئەنقەست بەستەم کوشت سەرپێچیکارە، ئەگەر دانینا بەوەی کەسێك بکوژێ دەستەلات و پلەوپایەی دەستگیردەبێ بەپێی ئایەتی: ﴿ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا ﴾ (القصص: ٣٣) دوای دانپیانان دەستەلات و پلەوپایەی دەستگیردەبێ.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی کوژرا نکوولی لەنوێژدەکات یاخود وازی لێدەهێنێ.

*ئەگەر بینی کوڕەکەی خۆیکوشت رزق و رۆزی دەستگیردەبێت.

*ئەگەر بینی دووسەد کەسی کوشت دووسەد درهەمدەدات و غەم و پەژارەی دەڕەوێتەوە.

*ئەگەر بینی لەپێناوی خودایا کوژرا بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانج لەبازرگانیداو بەجێهێنانی بەڵێن و پەیمان، دەگونجێت خەوبینەر بەنوقمبوون یا ژانەسك بمرێ.

*ئەگەر کوژراو گەواهیدەدا لای دەستەلاتدار گەواهی و شەهادەکەی پەسەنددەکرێ، دەگونجێت دنیایەکی بەرین و فراوان بەدەستبهێنێت لەگەڵ نازونیعمەتێکی دیارو ئاشکرا.

**کوفی**[1]: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر خۆپاراستن لەچارەسەری بەسوود.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر شەڕ یان ئەوەی سەردادەپۆشێ لەخودەو عەمامە.

**کوللە**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: کوللە سەربازو دەنگەدەنگو قاوقیژەو دێت بەدوویەکدا.

---

[1] **کوفی**: ئەوەی دەدرێتە پاڵ کوفە. (وەرگێڕ)

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر باران ئەگەر بکەوێت سەریاندا یاخود مانگەگەرمەکانی هاوین بێت.

*ئەگەر زیادیکرد بەپێچەوانەی کوللەوەبوو لەنێوان زەوی‌و ئاسماندابوو سزاو خەشمە، هەروەها کێچ‌و بۆق‌و خوێنیش وایە، چونکە بەڵگەو نیشانەبوون لەسزادانی بەنی ئیسرائیلدا مەگەر خەڵکی کۆی بکەنەوەو بیخۆن ئەوجا رزق‌و رۆزییەو روویان تێدەکات‌و بژێوییان زیاد دەکات.

*هەروەها دەڵێن: کۆکردنەوەی لەدەفرێکدا بەڵگەیە لەسەر درهەم‌و دینار.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودابینیم کوللەم کۆدەکردەوە لەگۆزەڵەو کوپەیەکدا، ئەویش وتی: درهەم‌و پارەیە کۆیدەکەیتەوەو بۆ ژنێکی دەبەیت.

*هەروەها دەڵێن: هەموو شتێك کوللەی تێبکرێ‌و بەدەر نەکەوێت بەڵگەیە لەسەر خۆشی‌و شادی بەپێی چیرۆکەکەی (ئەیوب) (سەلامی خوای لێبێت).

*ئەگەربینی کوللەی ئاڵتوونی دەبارێت نیعمەت‌و خۆشحاڵی بەدەستدەهێنێت.

*هەروەها دەڵێن: کوللە نانەوایەکە ناپاکیدەکات لەگەڵ خەڵکیدا.

(نابلسی)دەڵێت: کولله لەخەودا سزای خوایی‌و سەربازانی پەروەردگارە، چونکە لەبەڵگەو نیشانەکانی موسایە(سەلامی خوای لێبێت).

*ئەگەر کولللەباری سزای خواییە، ئەگەر لەشوێن‌و جێگەیەکدا بینی دەخورێت‌و بەشێکی لێدەبرێت ئەوەش رزق‌و رۆزییەو خاوەنەکەی بەدەستی دەهێنێت، ئەگەر خرایە نێو دەفرێك دینارو درهەمە.

*هەروەها دەڵێن: کوللەفیتنەو دوژمنە، هەروەها کولله بەڵگەیە لەسەر گوندو کێڵگەو ناڕەحەتی‌و بێکاریی‌و تیاچوون چونکە رووله رووەك‌و کشتوکاڵدەکات بەڵام لەبۆ خەڵکی بەڵگەیە لەسەر شەڕو خراپە بۆیان‌و هاوەڵایەتی ژنانی سوزانییە.

*ئەگەربینی کولله هەڵدەگرێت‌و دەیخاتە نێو کوپەیەك ماڵ‌وداراییەکی دەستدەکەوێت‌و دەیبات بۆ ژنێك.

*هەروەها دەڵێن: کولله بەڵگەیە لەسەر رووبەڕووبوونەوەی دوژمن‌و

بازدان بەسەر قەلاْوسەنگەرداو ماڵوسامان تالاْنکردن بەهۆی سوپایەکی مەزنەوە.

* دەگونجێت کوللە بەڵگەبێت لەسەر رزق و رۆزی حەلاْڵ.

* ئەگەربینی کوللە دەخوات کەمێك خێر لەسەربازان بەدەستدەهێنێت.

* ئەگەر وردە کوللەی بینی خەڵکی گشتیو گێرەشێوێنن، دەگونجێت بارانێکی بەخوڕو لێزمەبێت.

* دەگونجێت کوللە چوونە نێو شارێکەوەبێت بۆ هاوەڵێك.

* ئەگەربینی کۆمەڵە کوللەیەك هەڵدەگرێ فیتنەزۆردەکات لەدەستنیشانکردنی ئافرەتدا.

**کولم(گۆنا)**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بوونی بەهانەیە، ئەگەر لەسەر کولمو گۆناوە موو دەرهات ترسی ئەوەی دەبێت کۆتویەند بکرێتە گەردنی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رێحانەو مۆرد هەروەك چۆن رێحانەو مۆرد بەڵگەن لەسەری.

* دەگونجێت بەهانەیەکی روونو ئاشکرابێتو زیادبوونی رزقو رۆزی یاخود گەڕانەوەی کەسێکبێت لەسەفەر یان هاتنی نامەیەك بێت لەوەوە.

* ئەگەر نەخشاندیو خاوەنەکەی جوانکرد مژدەیە بۆی، ئەگەر ناشیرینیکرد بەڵگەی غەمو پەژارەو نەهامەتییە.

**کون کون**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: پیاوێکی مەزنی فرۆفێلاْوی قسەتوندو تیژەو بەڵگەیە لەسەر بڕ هەڵکەندن و پیاوێك زندەهێنیو خاوەنی ئاژەڵی نێر دەبێت.

(نابلسی)دەڵێت: کون کون بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی پێداویستیو پەناوپشتگیر لەسەر ویستو خوازەکان.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەر.

**کونار( نەبك )**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: پیاوێکی باشە بەکۆڕای راڤەکارانی خەو بەهۆی پیرۆزی دارەکەوەو بەهێزییەوە ماڵو رزقو رۆزییە. تەڕەکەی بەهێزترە لەوشکی، زەردیەکەی هیچ زیانێکی نییە، هیچ شتێك لەلێکدانەوەدا ئەوەندە باش نییەو بۆ دنیاو ماڵوسامانە بۆ ئاینداران زیادی چاکەو ئاینەو ماڵێکە بەدەر لەدیناروو درهەم.

* دەگێڕنەوە ژنێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و پێی دەڵێن: لەخەودا بینیم

دار (كونار"نەبك")كەوتە نێو ماڵەكەمو دوو نەبكم هەڵگرت، ئەویش پرسی: مێردەكەت رۆیوە؟ وتی: بەڵێ وتی: دەمرێتو دووهەزارت بەمیراتی بۆ بەجێدەهێڵێت.

*هەندێكدەڵێن: رزقو رۆزییەكە لەلای (عێراق)ەوە، خواردنی كونار بۆ دەستەڵاتدار دەستەڵاتەكەیەتی.

(نابلسی)دەڵێت: بۆ ئاینپەروەران چاكییەو، خواردنی دەستەڵاتەو بۆ یەكێك شایستەی بەڵێندەرایەتی بێت هێزو توانایە.

*ئەگەر خەوبینەر لەناڕەحەتیدابوو داركوناری بینی لەكاتێكدا كاتی نەبوو بەڵگەیە لەسەر مانەوەی تا ئەودەمە، بەهەمان شێوە ئەگەر لەخێردابوو.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەرێزو داپۆشەرە ، هەروەها دارەكەی پیاوێكی بەڕێزی رەنگكردوە، ئەوەی بەروبوومەكەشی ببینێ ناوبانگی بەرزدەبێتەوەو خواناسیو زانیاری بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر لەو دارەبخوات نەخۆشیەكی توندو سەختدەگرێ.

*ئەگەر بینی سەردەكەوێت بەسەر دارەكەدا غەمو پەژارەو ناڕەحەتی دێت بەسەردا.

**كونجی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵێكی هەڵگیراوەو وشكەكەی بەهێزترە لەتەڕەكەی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا رزقو ماڵی حەلاڵە ، هەروەها پالاوتنیو شێلانی ماڵێكە لەهێزو شكۆیدایە.

*ئەگەر بینی كونجی دەڕوێنێ دەستەلاتێكی تازەگەشەكردوو بەدەستدەهێنێ لەگەڵ بازرگانیەكی زیادەو خواناسیو كاروكاسبیو خۆشی.

*هەروەها دەڵێن: كونجیو خەردەل بۆ بەتەنیا بۆ پزیشك باشە بۆ سەرجەم خەڵكی بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی گەرم.

*ئەوەی كونجی ببینێ زیانی لێدەكەوێت.

**كوندر**[1]: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەپێی خۆیەتی.

**كوندەپەپوو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: كوندەپەپوو درێكی لێزانەو خاوەن سامو هەیبەتە.

(نابلسی) دەڵێت : كوندەپەپوو لەخەودا پادشایەكی مەزنە خەڵكی لێیدەترسن ، كوندەپەپووش بەڵگەیە لەسەر بێكاریو رەواندنەوەی ترسوبیم.

---

[1] **كوندر:** شیلەیەكی تایبەتە لەدرەختێك دەردەهێنرێ (فەرهەنگی دەریا: ج٢/١٠٧٣)

*کوندەپەپووی مێینە مرۆڤێکی ناپاك‌و فرۆفێڵاویەو هیچ خێرێکی تیانییە.
*ئەوەی ببینێ چارەسەری کوندەپەپوویەکی مێینە دەکات چارەسەری مرۆڤێکدەکات هیچ بنەماو جێگیربوونێکی نییە لەسەر حەق‌و راستی.
*ئەوەی ببینێ کوندەپەپوویەکی مێینە کەوتوەتە ماڵەکەیەوە بەمەرگی مرۆڤێك خێر رووی تێدەکات.
*کوندەپەپوو بەڵگەیە لەسەر دز لەنێوان دوو دیواردا لەگەڵ رزق‌و رۆزی سوار.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر جیاوازی‌و غەمباری‌و نابەجێی کرێکارو قسەی پووچ‌و نابەجێ.
**کونی دوروگەوهەر:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیەلەسەر بەجێگەیاندنی کاروبارو ئاسانبوونی کاری قورس‌وهاوسەرگیری.
**کونی مشك:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: کون لەسەر زەوی‌و دیواردا دەم‌و زارە ، ئەوەی کونێك ببینێ ئاژەڵێکی لێدێتەدەرەوە دەم‌و زارێکە قسەو گوتەیەك دێتە دەرەوەلێی‌و لەلێکدانەوەشدا وەك ئەو ئاژەڵە وایە.
*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)دەڵێت: کونێکی تەنگەبەرم بینی گایەکی مەزنی لێهاتە دەرەوە، ئەویش وتی: کونەکە دەمە کاتێ وشەیەك دێتەدەرەوە ناتوانرێت بگەڕێنرێتەوە.
(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر شوێنکەوتنی بیدعەو پابەندبوون بەشوێنەواری بیدعەچی‌و وێڵ‌وسەرگەردانەکانەوە، کونیش خەڵوزە.
**کوێری(نابینایی):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر چاوی لەدەستدا نازو نیعمەتی نامێنێت. ئەگەر بینی هەردوچاوی لەدەستدا شتێکی بەسەردێت دڵی پێخۆشدەبێ.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: کوێری سەرگەردانییە لەئایندا یاخود بەدەستهێنانی ماڵ‌و داراییە لەلایەکەوە.
*ئەگەر بینی کوێربوە ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت.
*هەروەها کوێری بەڵگەیە لەسەر لەبیرکردنی قورئان بەپێی ئایەتی: ﴿قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى﴾ (طه:١٢٥).
*ئەگەر بینی مرۆڤێك کوێریکرد وێڵ‌و سەرگەردانیدەکات لەراوبۆچوونی خۆی.

*بینینی بێباوەڕی کوێر بەڵگەیە لەسەر زەرە یان غەم و پەژارە.

*ئەگەر کوێرێکی بینی پیاوێك چارەسەریدەکات و چاوی چاکبوەوە رێنومایدەکات بۆ کارێك خێری تێدایەو تەوبەی تێدا دەکات.

*دەگونجێت کوێری بەڵگەبێت لەسەر سستی باسکردن.

*ئەگەر لەرەشێنەی چاودا سپێتی بینی بەڵگەیە لەسەر غەم و پەژارە کەتووشیدەبێت.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (جەعفەری صادق)(رەزای خوای لێبێت)و دەڵێت: تانەم لەچاوی خۆمدا بینی، ئەویش وتی: کەموکوڕی روو لەماڵ و سامانت دەکات پاشان ئەوەی خوازو ئومێدەواریت لەکیستدەچێت.

*ئەگەر هەندێك لەخزمە نزیکەکانی ئاوارەبوو یاخود سەفەریکردبوو گەڕایەوو کوێربوبوو خەوبینەر دەمرێت، چونکە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر میوانێکی کوێری نەناسراو.

*هەروەها دەڵێن: تانەی سەرچاو بەڵگەیە لەسەر غەم و پەژارەیەکی گەورە روودەکاتە خەوبینەرو ئارادەکرێ لەسەری بەپێی چیرۆکەکەی (یەعقوب) (سەلامی خوای لێبێت).

*ئەگەر بینی چاوی ئاوی رەشی داهاتوەو هیچ نابینێ خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر کەمی ئابڕوو چونکە چاو شوێنی ئابڕووە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی کوێربوە تێکۆشان یا (حەج)ێکی لەبەردایە.

*ئەگەر بینی کوێرە باس‌وخواسی هەڵدەگیرێ بەڵام باسناکرێ، دەگونجێت لێکدانەوەی ئەوەبێت دەستەلات و زانیاری بەدەستبهێنێت بەپێی چیرۆکی (ئیسحاق)(سەلامی خوای لێبێت).

*ئەگەر بینی کوێرەو پشتیکردوەتە قیبلە لەسەرگەردانیدایە.

*ئەگەر بینی هەردوو چاوی کوێربوون پیاوێکە پەردەی نهێنی پۆشی نێوان خۆی‌و خوداوەند دەشکێنێ.

*ئەگەر لەخەودا چاوی کوێربوو هەژاردەکەوێ دوای دەوڵەمەندی یاخود ئەو ماڵ و دارایییەی لای شیرینە لەدەستدەدات یا منداڵ و خانەوادەکەی کەشیرینن لەنێو دڵ و دەروونیدا.

*دەگونجێت بیری ئاوی هەبێت‌و دایپۆشێت یا پاسەوانەکەی لەدەستبدات یان سیخوڕەکەی ماڵ و دارایی نەمێنێت، یان لەوانەبێت خەشم و قینی لەکاری چاکە هەڵبسێ.

*ئەگەر نەخۆشبوو بینی چاو نابینابوە بەڵگەیە لەسەر کۆچی دوایی.
*دەگونجێت کوێری بەڵگەبێت لەسەر کەڕی.
*دەگونجێت بۆ گوێڕایەڵان بەڵگەبێت لەسەر خەشمو قینبوونەوە لەدنیاو وردبوونەوە لێی بەچاوی کەمو سووکەوە.
*دەگونجێت کوێری بەڵگەبێت لەسەر پەنهانکردنی نهێنی.
*کوێری بۆ غەریبو ئاوارە بەڵگەیە لەسەرئەوەی ناگەڕێتەوە بۆ نیشتمانی خۆی.
*کوێری بۆ زیندانی قوتاربوونە چونکە خەڵکی بەزەییان بەکەسی کوێردا دێتەوەو دەستیدەگرن.
*ئەگە خوازیاری داوایەکبوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی بەدەستینەهێناوە، چونکە چاو کاتێ کوێردەبێ ناگات بەخواستو داوای خۆی.

## ك وو

**کووپە** (**گۆزە**): (ئیبن سیرین) دەڵێت: کوپەو گۆزە ژنێکی خێرۆمەندەو لێخواردنەوەی ماڵو داراییەکە لەلایەن ئەو ژنە بەدەستیدەگات.

*ئەگەر بینی ئاوێکی هەڵگۆزیو کردیە نێو گۆزەیەك دەست بەسەر ماڵێکدا دەگریو لای ژنێك ئەسپەردە دەکات، کووپەو گۆزەڵەش وەك مەرکانەی ئاو وایە.
(نابلسی)دەڵێت: گۆزەڵە لەخەودا ژنێکی داوێنپیسی زیناکارەو لێکدانەوەی هەموو کوپەیەکیش بەوپێیەو بیر یاخود مەرکانەی ئاویش بەڵگەیە لەسەر:
+چاودێرو بەخێوکاری خانەوادە.
+فرۆشگاو گەنجینە.
+هاوسەری دووگیان.
*گوپەی مەی بەدەستهێنانی گەنجینەیە.
*بیریش ئەگەر ئاوی تێدابوو کەوتبوە ماڵێکەوە ژنێکی دەوڵەمەندی خەمو پەژارەدارە، ئەگەر بیرە ئاوەکەش هی ئاو دەربوو پیاوێکی فرە ماڵو داراییەو زۆر خێردەکات لەپێناوی خوادا.
*هەروەها ئەگەر بیرەکە سرکەی تێدابوو پیاوێکی ئایندارە، ئەگەر کەرەی تێدابوو خاوەن ماڵو داراییەکی بێئاگایە، بەلام ئەگەر داودەرمانی چێشتی تێدابوو پیاوێکی نەخۆشو بیمارە.

*ئەگەر بینی کووپەیەك دەشكێ بەدەستیەوە ژنەكەی تەلاقدەدات.

**كووره( توون ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو گومان، كورەی گەچ بەڵگەیە لەسەر كەوتن بەسەر ئابرووی زانایاندا بەقسەی خراپ بەپێی ئایەتی: ﴿ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ ﴾ (البقرة: ٧٤)كوورەی خستی سورەوەكراو بەڵگەیە لەسەر زوڵمو ستەمو هاوەڵپەیداكردن.

*دەگونجێت كووره بەڵگەبێت لەسەر دۆزەخو خەڵكی دۆزەخیو زیندانو زیندانییەكان وەك حەمامو ئەوانەی لەحەمامدان.

**كوورەی ئاسن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: كوورەی ئاگر ژنێكە لەخانەوادەی ماڵو خاوەن هێزو توانایە.

*ئەگەر لەزێڕبوو لەخانەوادەی دنیاویستان دەبێ، ئەگەر لەتەختەبوو لەماڵێكدەبێت دووڕوویی تیادەبێ، ئەگەر لەگەچبوو لەخانەوادەیەكدەبێ لەفیرعەونیەكان دەچن، ئەگەر لەگڵ دروستكرابوو لەخانەوادەی ئاینداروخواناسدەبێ.

*ئەگەر كوورەكە ئاگری تیابوو بەڵگەیە لەسەر دەوڵەت، ئەگەر بەتاڵبوو لەئاگر بەڵگەیە لەسەر پشوو.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ئاگرێكی بینی لەكورەیەكدا بڵێسەی دەدا یان لەتەنورێكدا بەڵگەیە لەسەر منداڵی نێرینەی خەوبینەر.

*كووره بەڵگەیە لەسەر بژێوی پەیداكاری ماڵ.

*ئەگەر بینی لەنێو كوورەكەدا ئاگردەكاتەوە بەبێخواردن گەرووی خانەوادەكەی بەدووزوبانیو شەڕو ئاژاوە دەورووژێنێ.

*ئەگەر مەنجەڵ نرخی ماڵبوو كووره مێردەكەیەتی ناڕەحەتی رووی تێدەكاتو ماندوویەتی دەكێشێو لەماڵدا سەری خۆی كزدەكات.

*دەگونجێت كووره بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرو مەنجەڵیش پیاو بێت.

*ئەگەر كوورەی ئاگری تێدا نەبوو بەلگەیە لەسەر غەمو پەژارە، ئەگەر ئاگری تیابوو پێداویستیو رۆزییە.

*كووره بەڵگەیە لەسەر چوونە لای خێزانو سواربوونی هۆكاری گواستنەوە یاخود بەدەستهێنانی پلەوپایە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+بەدیهێنانی کاروبارو ئاسانکردنی کاری قورس‌وگران.
+باوك‌و دایك.
+کوڕ بۆ دووگیان.
+فرۆشگاو دووکان.
+مانگی (کانوون).
*ئەگەر بوو بەخاوەنی کووره هاوسەر دەگرێ ئەگەر رەبەنبێت، ئەگەر ژنبوو دووگیاندەبێت، ئەگەر بێباوەڕبوو بڕوا دەهێنێت ئەگەر خراپەکاربوو تەوبەدەکات.
*پیاوێك لەخەودا کوورەیەکی بینی هەندێك ئاگری تێدابوو لەگەڵ تەختەیەکی نزیك لەوکورەیە، راڤەکارێکیش پێی وت: کوورەکە گەورەی تۆیەو تەختەکە خواردنێکی قورسەو دوێنێ خواردووتە، پیاوەکەش وتی: لێکدانەوەکەت بەو چەشنەیە.
**کووزەڵە:** (نابلسی)دەڵێت: خواردنی دۆزەخیەکانەو بینینی لەخەودا باش نییە، ئەگەر بیخوات کرداری دۆزەخیەکان ئەنجامدەدات.
**کوولەکە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی زانا یان پزیشکێکی بەسوودو کەڵکە نزیکە لەخەڵکییەوەو پیرۆزە.
هەروەها دەڵێن: پیاوێکی هەژارە.
*کوولەکە بۆنەخۆش چارەسەرە، ئەگەر بینی بەلێنراوی شتێکی وندەدۆزێتەوە یاخود زانیاریەك دەپارێزێ بەئەندازەی پاراستنی یاخود شتومەکی کۆکراوە کۆدەکاتەوە.
*ئەوەی لەلێنراوەکان باشە لەخەودا کوولەکەو گۆشت‌و هێلکەیە.
*ئەگەر بینی کوولەکەیەکی بۆگەنی خوارد لەگەڵ مرۆڤێك تووشی دەنگە دەنگ‌و بەزم‌و شەڕ دەبێت، پاشان لەجنۆکە دەترسێ.
*ئەگەر بینی لەکاڵەکدا کوولەکەی هەڵگرت لەنەخۆشیەکەی چاکدەبێتەوە بەهۆی دوعاو چارەسەریەوە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر یەکێك بەکوڵاوی بیخوات تووشی سەرزەنشتدەبێت یان زانیاری بەئەندازەی خواردنی بۆ کوولەکەکە.
*کوولەکە بەڵگەیە لەسەر:
+غەم‌و پەژارە.
+قورسی بژێوی‌و ژیان.
+نەخۆشی‌و زیندان.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەروونسافی‌و پاکێتی.
*دەفری کوولەکە بەڵگەیە لەسەر ژنی شۆخ‌و شەنگ‌و نازدارو روحسووك‌و ناودار.

*ئەگـــەر بینـــی كولەكەیـــەكی بۆگـەنیخوارد بەلگەیـە لەسـەر شـەڕو دەنگەدەنگ، ئەگەر بەلێنراوی خواردی داوودەرمـانی خـواردنی لەگەڵـدابوو بەلگەیە لەسەر غەمو پەژارە، ئەگەر بێـــداوودەرمانبوو رزقو رۆزییـــە، دەگونجێــت ویــستووخوازی خـــۆی بدۆزێتەوە.

**ك ۆ**

**كۆتر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: كۆتر ژنـی ســالحو بــاشو خۆشەویــستەو لەمێردەكـــەی زیـــاتر كەســیتری خۆشناوێت.

*كـۆتر بەلگەیـە لەسـەر هـەواڵێكی كتـوپڕو پێغەمبەرو پەرتووك، چونكە هــەواڵ لەكتێبــەوە دەگوێزێتــەوەو بنەڕەتی ئەو باسەش بەم چەشنەیە: (نــوح) (ســەلامی خـــوای لێبێــت) قەلەڕەشێك دەنێرێت هەتا باری كەشو هەوای پـێ رابگەیـەنێت، كـاتێ دەچـێ كـەلاكێك لەسـەر ئاوەكـەوە دەبینـێو خۆی پێوە خەریكدەكات، ئنجا كۆترێك دەنێرێـتو شـتێكی سـەوز دەبینـێو دوعای بۆ دەكات، بەچەشنێك بۆئەوەی لەناڕەحەتیدایە یا بۆ ئەوەی كەسێكی غەریبی هەیەو لەهەمان كاتدا مژدەیە بـۆی ئەگـەر كـەوت بەسـەریا یـان هــەڵفڕیو بینــی، مەگــەر نــەخۆشو لەشگران بێت بكەوێت بەسەریا ئەوكات كـــۆتر مردنـــە بەتایبـــەت ئەگـــەر لــە(یــەمام)ەوە بێــتو لەســەرویەوە بخوێنێت لەخەودا.

*دەگونجێت كۆتر كچ بێت ، باشترین كۆتر كۆتری سەوزە.

*ئەگـەر بینـی بـوە بـەخاوەنی پـۆڕە كــۆترێكی زۆر دەســتكەوتو خێــری پێـــدەگات، هێلكەكەشـــی كـــچو خزمـــەتكارە، كوشــكو هێلانەكـــەی شوێنی كۆبوونەوەی ژنانە، هێلكـەكانی كوڕ یان كچە.

*ئەگـەر بینـی كۆترێـك بـوە بـەمرۆڤ پیـاوێكی زیناكـارو داوێنپیـسە، ئەگـەر دانەكـــەی پـــەرشوبلاوكردەوەو بـــوو بەگۆشــتو بــانگیكردن بـۆ خـواردنی رێبەرایەتیدەكات.

*گمـەگمی كـۆتر لەخـــەودا ســزادانی پیاوە بۆ ژنەكەی. كۆتری سپی ئاینـەو هــی سـەوزیش خواناسییەو، رەشـیش كەسانی بەناوبانگن لەژنو پیاو، كۆتری بەڵـــەك بەڵـــەك خـــەڵكی تێكـــەڵو پێكەڵكارە، ئـەوەی كۆترێـك هـەڵبفڕێت لێـــیو نەگەڕێتـــەوە لای ژنەكـــەی تەلاقدەدات یان دەمرێت.

*ئەگەر خاوەنی كۆمەڵە كۆترێكبوو چەن ژنێكی دەبێت لەگەڵ خزمەتكارداو خەرجیان بۆ ناكات.
*ئەگەر باڵی كۆترێكی بڕی سوێند لەژنەكەی دەخوات نەچێتە دەرەوە یان نابێت منداڵی دیكەی لێی ببێت یادووگیان بێت لێی.
*كۆتر پیاو یا ژنی عەرەبە ، ئەوەی سەریببڕێت مۆری كچێنی كیژێك دەشكێنێ ، ئەوەی گۆشتەكەی بخوات ماڵو سامانی ژنێكدەخوات.
*كۆتر لەگەڵ بەچكەكانیان ژنی زەوتكراوە لەگەڵ منداڵەكانی.
*كۆتری نامەبەر هەواڵێكە لەدوورەوە دێت ، ئەگەر ژنەكەی دووگیانبێت كوریدەبێت.
*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و پێی دەڵێت: لەخەودا بینیم كۆترێكی سپیم گرتو زۆر بەدڵمبوو، یەكێك لەچاوەكانی جوانترین چاوی كۆتربوو بەلام چاوەكەی تری خێلو تیلبوو، وامزانی زەردییە ، (ئیبن سیرین) بزەیەك گرتیو وتی: تۆ ژنێكی جوان دەهێنیتو زۆر بەدڵت دەبێت، مەترسە لەو ناتەواوییەشی لەچاویدا بەدیدەكەیت چونكە كەمو كوڕی لەچاویدا نییە بەڵكو كەمو كوڕی لەعەورەتیدایەو بەدخوو دەبێتو ئازارت دەدات، ئنجا پیاوەكە ژنەكەی هێناو رەوشتی خراپو چەوتی لێبەدیكرد.
(نابلسی)دەڵێت: كۆتر لەخەودا نوێنەرێكی ئەمینو چاكە یا هاوڕێیەكی راستگۆو خۆشەویستێكی لەبزشیرینو مەجلیسخۆشو بەچێژە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+هاوسەرانی داوێن پارێزو نهێنی هەڵگرو خورتەو بۆڵەكار بەسەر منداڵاندا.
+پیاوی فرە رەچەڵەك كەدەستیگرتوە بەسەر خانەوادەكەیدا.
*هەروەها بینینی كۆتر بەڵگەیە لەسەر لاواندنەوەو گریان.
*كۆمەڵە كۆترێك پلەوپایەو فەرمانڕەواییە.
*ئەگەر بینی لەگۆشتەكەی خوارد ماڵی خزمەتكاران دەخواتو دەبێت بەدەلاڵ.
*كۆمەڵێ كۆتر لەگەڵ بەچكەكانیان ژنی زەوتكراوە لەگەڵ منداڵدا.
*ئەگەر بینی كۆتر راودەكات ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت لەپیاوی رێزدار.
*گوتراوە ئەوەی كۆترێك ببینێ داوای هەرچییەك لەپەروەردگار بكات پێیدەبەخشرێ.

*ئەگەر کۆترێکی لەماڵەکەیدا بینیو خەوبینەریش رەبەنبوو ژنێکی جوانو شیرین دەهێنێتو دەبێت بەژنێکی ماڵداری گوێڕایەڵ بۆ مێردەکەی.
*ئەگەر بینی کۆترێك بازیدا بۆلای یاخود هەڵیگرتو بەرزیکردەوە شادیو خۆشی رووی تێدەکات.
*ئەگەر بینی بوە بەکۆتر ماڵو سامانی دوژمنەکانی دەخوات.
*ئەگەر بینی بەرد دەگرێتە کۆترێك ژنێك تاوانبار دەکات یاخود نامەیەکی پڕ لەقسەی ناخۆشی بۆ رەوانە دەکات.
*ئەگەر بینی هێلکەی کۆتری بەدەستهێناوە ماڵو سامانو منداڵی نێرینەو مێینەی لەژندەبێت.
*ئەگەر بینی کۆتری ماڵی راودەکات بەحەرامی دەچێتە لای ژنان.
*ئەگەر بینی کۆترو باڵندەیتر زیکەزیك دەکەن قسەو گوتەیەك دەدات بەگوێ ژنێکدا یاخود فێریدەکات.
*ئەگەر کۆتر یان هەر باڵندەیەکیتر بەسەرسەریەوە ببینێ یان بەگەردنیەوە بەستراوەتەوە بەڵگەیە لەسەر رەفتاروکردەوەکانی لەنێوان خۆیو پەروەردگاری.
*ئەگەر باڵندەکە رەشو ناشیرینبوو بەڵگەیە لەسەر بەدو خراپی کردارەکانی، ئەگەر سپیبوو دیمەنی جوانبوو بەڵگەیە لەسەر باشی رەفتارو کردارەکانی.
*ئەگەر بینی پەڕی کۆتر یاخود گۆشتی بەدەستدەهێنێت پارەو سامانی زۆری دەستدەکەوێت.

**کۆتری کێوی( قومری ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ژنێکی زبرو رەقی ئاین کزو لاوازی زماندرێژە.
*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر کابانی نێوماڵ یان ژنێکی خاوەن جوامێریو جوانو شۆخو شەنگ.

**کۆتو بەند:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر دەستی بەکۆتکراوی ببینێو کرابێتە گەردنی ماڵو سامان بەدەستدەهێنێ بەلاّم زەکاتی دەرناکات.
*هەروەها دەڵێن پارێزراو دەبێت لەسەرپێچی.
*ئەگەر هەردوو دەستی بینی کۆتکرابوو بەڵگەیە لەسەر رۆچوونی لەرژدیدا.
*ئەگەر کۆتو بەندکراو بێباوەڕبوو بانگدەکرێ بۆ لای ئیسلام.
*ئەگەر بینی دەستگیرکراو کۆتو بەندیشکرا دەکەوێتە بەلاّو نەهامەتیەکی گەورەوە لەزیندانیو

باری بەپێی ئایەتی: ﴿ خذوه فغلوه ﴾ (الحاقة: ٣٠).

*ژنێك هات بۆ لای (ئیبن سیرین)و وتی: پیاوێكم بینی كۆتو بەندی پێوەبوو، ئەویش وتی: ئەو پیاوە بانگەشەی (عەرەبی)بوونی خۆیدەكات بەڵام وانییە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا كارو پیشەی حەرامە بەپێی ئایەتی: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَغُلَّ وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾(آل عمران : ١٦١).

**كۆڕ( كۆمەڵ )**: (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینینی لەخەودا كۆڕێكی وەعزو ئامۆژگاری بەستوەو خەڵكی ئامۆژگاری دەدات و خۆشی شایستە نییە ئەوا لەغەمو پەژارەو نەخۆشییدایەو نزاو دوعا لەخوداوەند دەكات دەرووی لێبكاتەوە.

*ئەگەر قسەی چاكو داناییكردو راستگۆبوو لەئامۆژگارییەكەیدا دەرووی لێدەكرێتەوەو لەنەخۆشیەكەی چاكدەبێتەوەو لەتەنگەژەییەوە دەچێت بۆ خێرو یاخود لەقەرزێك قوتار دەبێ یا بەسەر ستەمكارێكدا زاڵدەبێ.

*بینینی كۆڕێك لەشوێنو جێگەیەك یادی خوای تێدابكرێ وەك خوێندنی قورئانو نزاو پاڕانەوەو هۆنراوەی دنیا نەویستیو بەندایەتی وایەو بەڵگەیە لەسەر ئاوەدانی ئەو شوێنە بەدانانی بەپێی خوێندنەوەو دروستی ، ئەگەر لەهۆنراوەكەدا هەڵەی تێدابوو دەستەلاتەكەیدا تەواو نییە، ئەگەر هۆنراوەی غەزەلبوو دەستەلاتی پووچو بەتاڵە. ئەوانەی لەپیشەوكارەكانیاندا بەهرەمەندو بەتوانان بێهاوتان بەپێی شارەزاییان لەخوێندنەوەداو دەربڕینی پیتەكان لەگەروویان.

*ئەگەر كۆمەڵێكی ئاپۆرەبەستووی بینی بۆ دادگایی یان هاوسەرگرتن بەڵگەیە لەسەر رووداوێكی نادیارو دەرەنجامی كۆتایی بەخێرهاتن.

*ئەگەر كۆڕێكی وەعزو ئامۆژگاری بینی ئامۆژگاری تێدا دەكرد كاروبارەكانی بەجێدێت ئەگەر وەعزەكەی ئەنجامدا، وەگەرنا ئەستەمە گەڕانەوەی كارەكانی.

*كۆڕ لەخەودا ئەو شوێنەیە خاوەن بڕیارانی دەوڵەتی تێدا دادەنیشن یان ئەو ئاژەڵەیە بەگەڕیدەخات یان هاوسەرو كوڕو خزمەتكارەكەیەتی.

*ئەگەربینی بانگكرا بۆ كۆڕێكی نادیار تێدا میوەو خواردنەوەی تێدابوو بانگدەكرێ بۆ جیهادو شەهیدبوون.

**كۆسپ( تەگەرە)**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا یەکێکە بۆپێداویستیەك چوەو پێداویستیەکی دنیایی یاخود قیامەتییە بەپێی مەبەستی لەخەودا.

* دەگونجێت کۆسپ بەڵگەبێت لەسەر ژنێکی کەللەرەق یاخود پیاوێکی رەق نەرمو نیانی نازانێت.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو کردارەی مرۆڤ لەمەترسی قوتاردەکات، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ (١١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ﴾ (البلد: ١١ـ ١٢).

* دەگونجێت چەن کۆسپێك بەڵگەبێت لەسەر ناڕەحەتیو مەترسیو زاڵبوونو بەسەر کۆسپەکانداو دابەزین لێی پارێزراوییو سەلامەتییە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دووپشك یان بەڵگەبێت لەسەر:

+ئاژەڵ.

+هاوسەر.

+پرد.

* دەگونجێت کۆڕ بەڵگەبێت لەسەر بەرزکردنەوەی پلەوپایە بەهۆی زانیاری یان سیاسەتێکی باش یاخود داناییەکی رەوان یان ژیاننامە یاخود پێدان یا چاودێریکردن.

* ئەگەر لەسەریەوە چوو بۆ خوارەوە پلەوپایەی نزمدەبێتەوە یان ماڵو دارایی تالاندەکرێ یاخود لەئاینەکەی پاشگەزدەبێتەوە.

* هەموو بەرزبوونەوەیەك مرۆڤ بەدی بکات بەسەر کۆسپدا یان تەپەو بەرزاییەکدا یاخود سەربانێك خوازو پێداویستی بەدەستدەهێنێ.

* بەرزبوونەوە بەڕێکی ناڕەحەتیو مەینەتەو هیچ خێرێکی تێدا نییە.

* ئەگەر بینی لەتەپەیەکەوە دابەزی یان لەشاخو کۆشکێکەوە ئەوەی داوایدەکات کەلیو ناتەواوی بەخۆوە دەبینیو تەواو نابێ.

**کۆشك( سەرا ـ تەلار)**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر درۆو خۆبەزلزانینو وێرانە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رێنوماییو ئاشتی.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: بۆ خراپەکار زیندانەو تەنگەشەی ماددیو کەمو کورییە تێیداو بۆ کەسێکی بارودۆخ باش بەرزیو بڵندیو قەرزدانەوەیە، ئەگەر لەدوورەوە بینی دەستەڵاتە.

* کۆشك پیاوێکی بەرینو پارێزکارە.

* ئەگەر بینی چوە نێو کۆشکێك روو لەدەستەڵاتدارێکی گەورە دەکاتو

ئاینەکـەی باشـدەبێو خێروچـاکەی دەستگیردەبێ، خوداوەند دەفـەرموێ: ﴿ تَبَارَكَ الَّذِي إِنْ شَاءَ جَعَلَ لَكَ خَيْراً مِنْ ذَلِكَ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَار وَيَجْعَل لَكَ قُصُوراً ﴾ (الفرقان: ١٠).

*ئەگەر بینی بەسەر کۆشکێکەوەیەو کۆشـکی خۆیـەتی پلەوپایـەی بەدەسـتدەهێنێ لەگـەڵ شـکۆمەندی توانـا، ئەگـەر کۆشـکەکە هـی کەسـێکیتربوو خێـرو سـوود لەخاوەنەکەی وەردەگرێ.

(نابلـسی) دەڵێـت: کۆشـك لەخـەودا کارێکی چاکە ئاینداران ، ئەگـەر چوە نێـو کۆشـکێ هاوسـەردەگرێ، ئەگـەر چوە نێو کۆشکێ بەڵام لەقاچیدا کۆتو بەنـد هـەبوو هاوسـەرداری لەگـەڵ کەسـێکدا دەکـات کەهاوەڵایـەتی بەردەوامدەبێ.

*کۆشـك لەشـاردا نـازو نیعمـەتێکی مەزنو بەرچاوەو ژوورەکانیش ئەگـەر سـەرکەوت بۆیـان بـەرزیو بڵندییـە لەدنیادا بەدەستیدەهێنێت.

*هـەروەها دەڵـێن: بینینـی کۆشـك بەڵگەیە لەسەر چوار دەستکەوت:

١)پارەو سامان.

٢)دەستەڵاتو پلەوپایە.

٣)بەدەسـتهێنانی ویـستووخواز.

٤)خۆشحاڵیو شادی.

*ئەگـەر خـۆی لەکۆشـکێکدا بینیـەوە لەکۆشـکەکانی بەهەشـت پلەوپایـەو سـەرکەوتن بەسـەر دوژمنـدا بەدەسـتدەهێنێ یـان کـچێکی شـۆخو شەنگو جواندەکات بەهاوسەری خۆی.

*ئەگـەر کۆشـكو تـەلاری بـەدیکرد دوورومـەرجانی تێـدابوو کۆشـكو تەلارێك بەدەستدەهێنێت خزمەتکاری تێدابێت.

**کـۆکراوە:** (نابلـسی)دەڵێـت: بەڵگەیـە لەسـەر شـتی هـەرزانی بـەنرخ لـەبوونی کچو کوڕی پیرۆز یان میراتی.

**کۆکردنـەوە( جـەمکردن ):** (نابلـسی)دەڵێـت: لەخـەودا بەڵگەیـە لەسەر ئارەزوو هەستانو کۆکردنـەوەی ماڵوسامان.

(نابلـسی)دەڵێـت: بەڵگەیەلەسـەر کۆکردنـەوەی مـاڵودارایی، خوداوەنـد دەفـەرموێت: ﴿وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبّاً جَمّاً﴾(الفجر:٢٠).

*ئەگەر قـژی زۆربـوو مـاڵو داراییـەکی زۆری دەسـتدەکەوێت، ئەگـەر شـتومەکی جـەمکراوی پەرتـەوازەبوو مـاڵودارایی بەهـەدەر دەچێت، ئەگـەر

نەفسی خۆیکۆکردەوە هەوڵدەدات سەفەر نەکات و چیتر باسنەکرێت.
(نابلسی)دەڵێت: کۆکردنەوەی شتومەکی گونجاو لەخەودا وەك گەوهەر لەگەڵ ئالتوون یان دەنکی دانەوێڵە لەگەڵ دوورپ [illegible] بەڵگەیە لەسەر سوودوەرگرتن [illegible] لەزانیاری یاخود رێگەو [illegible].
**کۆکردنەوەی ئامرازەکانی راو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەخەودا [illegible].
**کۆکە(کۆخە):** (نابلسی) دەڵێت: کۆکە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سکالاو ناڕەزایی. ئەگەر بینی دەکۆکێ ناڕەزایی دەردەبڕێ بەدەستی پیاوێکی سەربە فەرمانڕەواوە.
*ئەگەر تا رۆژهەڵاتن هەر کۆکی دەمرێت.
*هەروەها دەڵێن: کۆکە بەڵگەیە لەسەرئەوەی دەیەوێت ناڕەزایی دەربڕێت بەرانبەر کەسێك بەڵام نایکات.
**کۆڵوبار**[1]**:**(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر کۆڵو بارێکی پێدا لەخورما بەڵگەیە لەسەر دارخورما ئەگەر میوەبوو بەڵگەیە لەسەر دارەکەی.
**کۆڵەکە:** (ئیبن سیرین): دەڵێت: کۆڵەکەی دارو قوڕو گەچ و خشت چاودێرو سەرپەرشتیار یان خزمەتکاری ماڵو ئەوکەسەیە کەئەرکی خزمەتکردنی لەئەستۆی خۆیدا هەڵگرتووە.
**کۆڵەکەی ماڵ:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ماڵ یان هاوسەرە.
**کۆمەڵ(تاقم ـ ئاپۆرە):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێکی بینی پەروەردگار رەحمی پێدەکات بەوەی کەوادەیخاتە ناڕەحەتی وتاقیدەکاتەوە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ترس و بیم و غەم و پەژارەو زەرەر، هەروەها ئەگەر کۆمەڵێك هاتنەلای نەخۆشێك یاخود مردوویەکی بینی لەنێو کۆمەڵێکدا خوا لێی خۆشبووەو رەحمی پێکردوە.
**کۆنە:** (نابلسی) دەڵێت: کڕینی جل وبەرگی کۆنە لەخەودا لەلێکدانەوەدا باش نییە چونکە کۆنە هەژارییەو فرۆشتنی باشە چونکە خراپە لەخۆی دووردەخاتەوە.

---

[1] **کۆڵوبار:** لەعەرەبییەکەیدا بەئەندازەی (٦٠) صاعه (وەرگێڕ).

(ئیبن سیرین)دەڵێت: کۆنەفرۆشیش پیاوێکی حاڵوبار مام ناوەندییە کڕینی کۆنە بەڵگەیە لەسەر هەژاریو فرۆشتنیشی بەڵگەیە لەسەر ڕەواندنەوەی هەژاری.

**کۆیلایەتی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا سوێندەو خەوبینەر دەیخوات.

**کۆیلە:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا کرایە کۆیلەو ئەوەی کردیشی بەکۆیلە نەناسراوبوو لای دەگونجێت لەکاتی بێداریدا شەرمەزارییکات، دەگونجێت بەئاگاداربوونی لەکاری خراپەی ملکەچو بەکۆیلەییکات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قەرزێك ڕوو بەماکەچی ببات.

*دەگونجێت نەخۆش بکەوێتو بکەوێتە ژێردەستی ئەوەی فەرمانی بەسەردا دەکرد.

*ئەگەر لەخەودا گەورەکەی فرۆشتی پلەوپایەو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێ، لەوانەیە بکەوێتە نێو پلانو فروفێڵە چونکە فرۆشتنی کەسی ئازاد ملکەچکردنیەتی، دەگونجێت خێرێکی دەستگیربێ بەپێی چیرۆکەکەی حەزرەتی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت).

*ئەگەر کۆیلەیەك ئازادبوو بەڵگەیە لەسەر:

+ئاسانی دوای توندی.

+گەیشتن بەهیواو ئاواتەکان.

*کۆیلایەتی لەخەودا غەمو پەژارەیە.

*ئەگەر بینی لەخەودا بوە بەکۆیلە غەمو پەژارە ڕووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی دەفرۆشرێ تەنگی ڕووی تێدەکات مەگەر ژنێك بیکڕێ ئەوسا ڕێزی لێدەگیرێو ڕۆزگرتنی بەئەندازەی نرخەکەیەتی.

*ژنی بێ مێرد ئەگەر کرا بەکەنیزەك لەخەودا شوودەکاتو هەروەها ئەگەر مێرددکەی فرۆشتیو بوو بەکەنیزەك تەڵاقدەدرێ.

*ئەگەر بینی بوە بەکۆیلەی بەردەستی دوژمنەکەی ملکەچو ڕسوادەبێت.

**کە**

**کەبابچی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کەبابچی ڕەوشتدادەرە، ئەگەر بینی پارچەیەك گۆشتی برژاو دەکڕێ کەسێکی زرنگو وریا بەکرێدەگرێ.

*هەروەها دەڵێن: کەبابچی پیاوێکە لەقسەکانیدا قاوقیژو دەنگە دەنگ هەیە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی دەچێت بۆلای کەبابچی تا گۆشتێکی برژاوی لێبکڕێ ئەگەر کوڕێکی هەبوو دەیداتە دەستی پەروەرشیارێك بۆ ئەوەی پەروەردەو فێرییکات.

*ئەگەر خۆی بینی بوە بەکەبابچی دەستەلاتێك وەردەگرێ لەبۆ دەرهێنانی ماڵی دەستەلاتدار بەزۆرو ستەم.

*دەگونجێت کەبابچی بەپزیشك لێکبدرێتەوە.

*کەبابچی دیلەوانە یان خەڵکی بەئاسنو دار ئازار دەدات.

*بینینی کەبابچی بەڵگەیە لەسەر تالانکردنی ماڵو روحکێشانو تالانی.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر منداڵی نێرینەبوون بەتایبەت ئەگەر برژاوەکە گۆشتی گوێرەکەبێ.

**کەپەك:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: کەپەك قورسیوگرانی بژێویەو خواردنی هەژارییە.

**کەپەکفرۆش:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی کەپەکفرۆش بەڵگەیە لەسەر دەستپاكو پارێزەری خێری خەڵکی.

**کەپەکفرۆشی ئارد:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر دادوەرو ئەوەی حەقو ناحەق لەیەك جیادەکاتەوە.

**کەتان:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی کراسێکی کەتانی لەبەرکرد بژێوی رێزدارو حەڵاڵی دەستدەکەوێو ماڵو سامانی لێکۆدەکاتەوە.

**کەتانساز:** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گۆڕانی کاروبارو گواستنەوەی مرۆڤ لەپیشەیەکەوە بۆ یەکێکیتر یان گواستنەوەی لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر یان گواستنەوەی قسە.

*پیاوێکی کاروبار سەختە لەگەڵ پیاوێکی گوستاخو ئازادا تێکەڵە.

**کەتانفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر ملکەچیو تاقیکردنەوە بەژنانو دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو ماندوبوون.

**کەتانی تەنك:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا گەڕانەوەیە لەوەی کەلەسەریبوە.

**کەتیرە( چەسپ ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کەتیرە ماڵی زیادەیە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کەتیرەی هەموو دارێك زیادەو رەچەڵەکی چاكو رەسەنە بۆ پیاو.

**کەچەڵ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەرکەسێك ببینێ کەچەڵبوە لەخەودا خوازیاری ماڵی گەورەو بەرپرسەکەی دەبێت بەڵام هیچ سودێکی لێوەرناگرێت لەدەردەسەری زیاتر.

*ژنی کەچەڵیش ساڵێکی وشكو قاتو قڕییە.

**کەرکەدەن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پادشایەکی مەزنە هیچکەس خوازیاری چاوپێکەوتنی نییە، ئەگەر کەسێك بینی دەیدۆشیێ ماڵو سامانێکی حەرام بەدەستدەهێنیێ لەدەستەلاتدارێکی مەزن، ئەگەر سواریبوو هەندێك لەفەرمانڕەواو سەرکردەکانە.

**کەرکی**[1]**:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کەرکی مرۆڤێکی داماوی لاوازە ئەگەر لەگەڵیابوو هاوەڵایەتی گەلو کۆمەڵێکی رەوشت خراپدەکات.

*هەندێکدەڵێن: بینینی سەفەرێکی دوورە کەدەکەوێتەبەری، ئەگەر لەسەفەردابوو بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە بۆ لای خانەوادەکەی.

*هەروەها دەڵێن: کەسانێکن ئالوودەی کۆبوونەوەو هاوبەشیدەکەن، ئەگەر بینی بەدەوری ولاتێکدا دەگەڕێ لەو ساڵەدا سەرمایەکی سەختو توند بڵاودەبێتەوە، لەگەڵ هێرشێك کەس خۆیناگرێ لەبەرانبەریدا.

*ئەگەر کۆمەڵێکی بینی کۆبوونەتەوە لەزستاندا بەڵگەیە لەسەر دزو جەردەو، بۆ ئەوەی لەسەفەردایە بەڵگەی خێرەو بۆئەوەی خوازیاری هاوسەرگیرییە باشەو بۆ یەکێکیش خوازیاری کوڕبێت کوڕە، ئەوەی بەدەستی بهێنیێ ئەجرو پاداشت بەدەست دەهێنیێو ئەوەی سواری ببێ هەژار دەکەوێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی کۆمەڵێکی زۆری هەیە پلەوپایەو ماڵو دارایی بەدەستدەهێنیێ ، گۆشتو پەڕەکەی ماڵو سامانە لەپیاوێکی هەژارو داماوەوە.

*ئەگەر بینی بەخێویدەکات دەستەلاتێك وەردەگرێ بەسەر کۆمەڵێکی داماودا.

*ئەگەر بینی چارەسەریدەکات چارەسەری پیاوێکی هەژاردەکات، ئەگەر گوێی لەدەنگیبوو لەغەمو پەژارە رزگاریدەبێت بۆ خێروچاکە.

**کەرویا**[1]**:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵو سامانێکە ماڵو دارایی دی پێ باشدەکرێ.

**کەروێشك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کەروێشك: ژنە، ئەوەی بیبات دەیکات بەهاوسەری خۆی ، ئەگەر سەری ببڕێ دەبێت بەهاوسەرێکی کۆچکردوو.

---

[1] **کەرکی:** باڵندەیەکە. (وەرگێڕ)

[1] **کەرویا:** روەکێکە شروبی لێدروستدەکرێ. (فەرهەنگی دەریا: ٢/١٠٤٥).

*هەروەها وتراوە: کەروێشك نیشانەی پیاوی ترسنۆکە.

(نابلسی) دەڵێت: وتراوە: کەروێشك ژنێکی خراپە ئەوەی ببینێ کەروێشکێ دەپێکێ ژنێکی خراپ دەهێنێ، ئەوەشی ببینێ گۆشتەکەی دەخوات یان پێستەکەی بەکاردێنێ خێرێکی کەمی لەژن دەستدەکەوێت، ئەوەی کوڕەکەی بیکرێ غەمو پەژارە بەهۆی بەڵاو نەهامەتیەوە رووی تێدەکات.

**کەرەوز:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا سامانێکە لەلایەن دەستەڵاتدارەوەو حەڵاڵە دواتر پیامەڵدانی بەدوودا دێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بێباوەڕی، یاخود بەڵگەبێت لەسەر جەنگو شەڕو فێڵ.

*دەگونجێت دەستەڵاتبێت لەگەڵماڵو سامانو منداڵدا.

**کەرەی پێستە:** لەخەودا هاوسەر یان بژێوییە، ئەگەر باشبوو یاخود نرخەکەی زۆربوو بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندی.

*بینینی کەرەفرۆش بەڵگەیە لەسەر دڵئارامیو هێمنیو دانیشتنو سەفەرنەکردن.

**کەڕ (کاس):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەرکەسێك ببینێ کەڕە یان لاڵە بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی ئاین.

(نابلسی) دەڵێت: کەڕ لەخەودا کەموکوڕییە لەئایندا چونکە خوداوەند لەبەرانبەر بێباوەڕاندا وتویەتی:﴿ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ﴾ (البقرة: ١٨)

**کەڕی هەردوو گوێچکە:** کەڕی لادانە لەحەق، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لەدەستدانی پشوو بۆنەوەی گوێو چاو بەڵگەیە لەسەری.

**کەژاوە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر ژنێکی گوندنشین، کەژاوەی حاجی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئاشتیو حەجو مژدە لەوڵاتدا دەیگەڕێنێ.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ژن چونکە تایبەتە بە ژنەوە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر جیاوازی.

**کەشتی:** (نابلسی) دەڵێت: کەشتی بەڵگەیە لەسەر هەموو ئەوەی بەهۆیەوە قوتاردەبێ لەنغرۆبوون چونکە خوداوەند بەهۆی کەشتییەوە (نوح) پێغەمبەری (ﷺ) قوتارو رزگارکرد لەگەڵ ئەوانەی باوەڕیان پێهێنا لەنغرۆبوونو بەڵاو نەهامەتی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئیسلام مەردوم بەهۆیەوە قوتاردەبێت لەفیتنەو نەزانین.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرێك بەهۆیەوە عەیبو ناتەواوی دادەپۆشریێو لەئاگرو بەلاو نەهامەتی قوتار دەبێ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر باوكو دایك بەهۆیانەوە مەردوم لەمردنو پێداویستی قوتاردەبن.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو رێبازو رێگەیەی مەردومو باوەڕداران قوتاردەبن بەگرتنەبەری لەئاگری دۆزەخ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیندانو غەمو پەژارەو ژێری.
*ئەگەر بینی سواری كەشتیەكبوە لەدەریادا تەماشای حاڵیان دەكرێت لەگەڵ ئەوەی پێیكەیشتوون، ئەگەر بێباوەڕبوو موسوڵماندەبێت بەتایبەت ئەگەر لەناوەڕاستی كەشتیەكەدا سواربیوو و دڵنیانەبوو لەتیاچوونی، ئەگەر تاوانباربوو پاشكەزدەبێتەوە لەتاوانو گوناهی، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت ، ئەگەر نەخۆشبوو لەنەخۆشیەكەی چاكدەبێتەوە ، مەگەر لەگەڵ مردوودا سواری ببێتو لەخەونەكەدا بەڵگەیەكی تێدا بێت لەسەر مەرگ ئەوجا سواربوونی قوتاربوونە لەفیتنەو ئاشوبەكانی دونیا، ئەگەر بەئاگابوو خوازیارو قوتابی زانیارییوو یان سوودی لەزانیاری وەردەگرت لەنەزانین قوتاردەبێ، بەپێی سواربوونی (موسا) (سەلامی خوای لێبێت)لەگەڵ (خضر) لەكەشتیەكەدا.
*ئەگەر كەسێكی قەرزار خەونێكی لەوچەشنەی بینی قەرزەكەی دەداتەوەو غەمو پەژارەی دەرەوێتەوە.
*ئەگەر كەسێكی بێبەش خەونێكی ئاوای بینی یان ئەوەی رزقو بژێوی تووشی گرفت هاتبوو خوداوەند رزقو رۆزی دەرژێنێ بەسەریا لەلایەكەوە خۆی پێنازانێت.
*ئەگەر كەسێكی رەبەن خەونێكی ئاوای بینی ژندەهێنێتو هاوسەر دەگرێ.
*ئەگەر لەخەونەكەیدا مردووی بینی لەقیامەتدا قوتاردەبێتو سۆزو بەزەیی خوداوەند بەدەستدەهێنێتو لەئاگری دۆزەخو ناڕەحەتیەكانی رزگاریدەبێ.
*ئەگەر هات بەسەر كەسێكی زیندانیدا قوتاردەبێ لەزیندانەكەیو دەبێت بەهۆكاری قوتاربوونی .

*ئەگەر گەیشت بەکەناری دەریا یاخود لەوشکانی دابەزی خێراو باشتر دەبێ، بەڵام ئەگەر کەشتیەکی وەستاوی بینی و شەپۆلەکانی دەریا هەڵسابوو وادەی زیندانیەکەی درێژ دەبێتەوە ئەگەر زیندانیبێت و درێژەدەخایەنێ ئەگەر نەخۆشبێ و رزق و رۆزی سواردەبێ و ناتوانێ سەفەر بکات، ئەگەر هەوڵبدات و ناتوانێ بگات بەهاوسەرکەی یان ساردەبێتەوە لەخوازیاربوونی بۆ زانست ئەگەر خوازیاربێ بەتایبەت ئەو خەونە لەوەرزی زستاندابوو لەکاتی هورووژانی شەپۆلی دەریادا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیندان بەپێی ئەوەی هات بەسەر (یونس)دا کاتێ لەنێو سکی نەهەنگدا بەندکرا، بەڵام دەرەنجامی سەرجەم ئەوەی باسمانکرد بەخێرو باش کۆتایدێت (پشت بەخوا) چونکە (نوح) قوتاربوو، (خضر)و (موسا)ش قوتاربوون و کەشتیەکەش لەدەست و چنگی پادشای داگیرکار دەرچوو رزگاریبوو، هەروەها (یونس) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) قوتاربوو لەو ناڕەحەتیەی تێدابوو، هەر بۆیە دەڵێن: ئەگەر کەشتیەك شکا یاخود درزی تێبوو قوتاردەبێت لەگەڵ سەرنشینەکانی مەگەر بکەنە وشکانی و بەسەر وشکانیدا بڕوات ئەوجا خێری تیا نامێنێ، ئەگەر نەخۆشبێت دەمرێت و دەگەڕێتەوە بۆ ئامێزی خاك و زەوی.

*ئەگەر قوتابییەك بینی کەشتیەکەی چوەسەر وشکانی و پێوەی رۆیی لەزانیاری و مشتومڕی دەچێت رووبە بیدعەو دووڕوویی و خراپە.

*ئەگەر قوتاربوو بۆسەر زەوی لەنێو ئاوەوە سوارەی ئەو کەشتییە لەحەق و پاکی قوتاردەبێت ، ئەگەر وانەبێت سوێند دەخوات لەهاوسەرەکەی و بەو حاڵەو لەگەڵی دەمێنێتەوە یان پیشەو بژێوی روو لەساردی دەکات و بژێوی و رزقی تەنگی پێهەڵدەچنرێ و دیسان روودەکاتەوە شێوەی جارانی بۆ پەیداکردنی رزق و رۆزی.

*ئەگەر کەشتیەك بەهەوادا رۆیی و بەڵگەیە لەسەری تادەچێت، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دارەمەیت بۆ فەرمانڕەوایەك نەخۆشبێت یان زاناو داناو سەرکردە.

*هەندێك دەڵێن: ئەگەر بینی لەکەشتیەکدایە لەدەریادا دەچێتە نێو دەستەڵاتێکی مەزن.

*كەشتی قورتابوونە لەبەلاو نەهامەتیو نەخۆشیو زیندانی بۆ یەکێك ببێت بەخاوەنی ، ئەگەر بینی تێدایە بەو چەشنەیە مەگەر قوتاری ببێت.

*ئەگەر لەکەشتیەکە هاتە دەرەوە رزگاربوونی خێراتر دەبێت ، ئەگەر لەنێویابوو بەلام کەشتیەکە لەسەر زەوییەکی وشکبوو غەمو پەژارەی توندو سەخت دەبێتو قوتاربوونی دووردەبێ.

*ئەگەر فەرمانڕەوایەکی لەکارخراو بینی سواری کەشتیەکبوە دەستەلاتێکی دیکەی پێدەسپێردرێ لەلایەن پادشایەکی مەزنەوە بەئەندازەی دەریاوو دەستەلاتدارییەکەشی بەئەندازەی پتەوی کەشتیو فراوانییەتی لەگەڵ دووری کەشتیەکە لەوشکانییەوە.

*هەروەها دەڵێن: سواربوونی کەشتی لەدەریادا سەفەرە بەناڕەحەتیو مەترسیداری، دووریشی لەوشکانییەوە دوورییەتی لەدەروو قوتاربوونە.

*ئەگەر سواربوونی کەشتی بۆ بەجێهێنانی فەرمانێکبوو مەترسی دێتە ڕێو ئەگەر هاتە دەرەوە لێی قوتار دەبێو سەرپێچی خوداوەند دەکات

بەپێی ئایەتی: ﴿ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴾ (العنكبوت: ٦٥).

*ئەگەر خەوبینەر دەستەلاتەکەی بەسەرچوو یاخود بازرگانبوو کەشتی گەڕانەوەی ئەوشتانەیە، ئەگەر کەشتیەکە نغرۆبوو خۆی بەپارچە تەختەیەکدا هەڵواسیو دەستەلاتدار تووڕەدەبێت لێی ئەگەر فەرمانڕەوابێت پاشان قوتار ەبێتو فەرمانڕەوایی بۆ دەگەڕێتەوە ، ئەمەش کەلوکەمبوونی سامانییەتی پاشان قەرەبووکردنە بۆی، ئەگەر نوقمبوو وەك خۆیەتی.

*ئەگەر بینی لەنێو کەشتیەکدایە لەنێوجەرگەی دەریادا دەکەوێتە دەستی کەسێك لێیدەترسیو مەرگی قوتاربوونە لەشەڕێك دەستەو یەخەیدەبێتەوە.

*نوقمبوونی کەشتیو بلاوبوونەوەی پارچەکانی بەلاو نەهامەتییە بۆ یەکێك ئازیزو خۆشەویست بێت لای.

*هەروەها دەڵێن: نوقمبوونی کەشتی سەفەرێکی پارێزراوە بەپێی فەرمایشتی خوداوەند:﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ ﴾ (ابراهیم: ٣٢).

*کەشتی پڕ لەخەڵکی پارێزراوییە بۆ ئەوانەی لەنێویدانو سەفەر دەکەن

بەپێی ئایەتی: ﴿فَأَنجَيْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾ (الشعراء:١١٩).
*هەڵگرتنی سەوڵی کەشتی بەدەستهێنانی زانیارییە یاخود بەدەستهێنانی ماڵو داراییە بەناخۆشی، گرتنی پەتی کەشتی باشی ئاینە لەگەڵ هاوەڵایەتیکردنی پیاوچاکان بەبێئەوەی لێیان جیاببێتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُوا﴾ (آل عمران : ١٠٣).
*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم لەنێوکەشتیەکی ڕەشدام هیچی تێدا نەماوە جگە لەپەتو گوریس زیاتر، ئەویش وتی: تۆ پیاوێکی هیچ لەئاینەکەت نەماوە جگە لەدڵسۆزی زیاتر، پەتو گوریسی کەشتی دینداران.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا قوتاربوونە بۆ یەکێك لەغەمو پەژارەو نەخۆشیو نەبوونیو قاتو قڕیدابێت.
*ئەگەر کەشتیەکی لەوشکانیدا بینی نزیکبوونەوەی قوتاربوونە، ئەگەر بەسەر زەویدات بەکێشیکرد دەویتیو دووڕوویی ئەنجامدەدات لەئایندا، ئەگەر سواریبوو لەگەڵ کۆمەڵێکی پیاوچاکدا ڕێنومایی وەردەگرێو خوداوەند لێیخۆشدەبێ، ئەگەر لێی هاتەدەرەوە شادو قوتاردەبێت لەدوژمنانی.
*ئەگەر یەکێك بینی کەوا شایستەی فەرمانڕەوای نەبوو دەکەوێتە مەترسیەوەو تێدا قوتاربوون یا تیاچوون بەدەستدەهێنێت، ئەوەی خەریکبێت تیابچێت ببینێ سواری کەشتیەکبوە دەڕوو قوتاربوون ڕووی تێدەکاتو دەست بەپیاوێکی مەترسیدارەوە دەگرێ ، ئەگەر لێوەی هاتە وشکانی سەرپێچیدەکات.
*ئەگەر کەشتیەکە دەدرایە پاڵ دەستەڵات هاتنە دەرەوەی لێی بەسەرچوونی دەستەڵاتیەتی بەمردن یان ژیان، ئەگەر درایە پاڵ غەمو پەژارە قوتاردەبێ بەدوعا یاخێر یاخود چارەسەر یان هەر هۆکارێکیتر.
*ئەگەر بینی لەنێو کەشتیەکدایە تێکەڵ بەدەستەڵاتکی مەزندەبێتو حاڵی وەك ئەوکاتەی لێدێت لەنێو کەشتیەکەدابوو.
*هەروەها دەڵێن: کەشتی لەلێکدانەوەدا غەمو پەژارە یا نەخۆشیو زیندانیە یاخود کارێکە هەوڵی بۆ دەداتو بۆیبەجێنایەت بەڵام قوتاردەبێت لێیو ناشکێ.

*ئەگەر بینی لەنێو کەشتیەکدایە ناڕوات زیندانە، ئەگەر دەستیگرت بەپەتەکانیەوەو لەچاکەکارانبوو لەکەسە نزیکەکانی دێتە پێشەوەو پەیوەندیان پێوە دەکات.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا کەشتیەکی گەورەی بینی وەستاوە ئەو ساڵە فەڕو بەرەکەت زۆردەبێتو رزق‌و رۆزی فراواندەبێ.
*ئەگەر بینی لەگەڵ خانەوادەو هاوڕێکانی سواربوو شکۆمەندیو جوانی خێرو فەڕ بەدەستدەهێنێتو لەدەستی دوژمنان قوتار دەبێت.
*ئەگەر بینی بەسواری یەختێکەوە دەپەڕێتەوە کارێکی مەترسیدار ئەنجامدەداتو بەهۆیەوە غەم‌و پەژارە رووی تێدەکات.
*ئەگەر مرۆڤێك بینی لەنێو کەشتیەکدا دەڕوات بەهێواشیو خۆشی دەبینێت بەڵگەی خێرە بۆسەرجەم خەڵکی، ئەگەر ناڕەحەتی رووی تێکرد بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارە بەرپابوون.
*ئەگەر کەشتیەکەی درزو قلێشیبردو حاڵی سەرنشینانی ئاڵۆزبوو، بەڵگەی خراپە بۆ سەرجەم خەڵکیو واژووی ئەوەی دیلو زیندانییەو بەڵگەیەلەسەر قوتاربوون لەزیندان‌و کۆتو بەندو دیلی.
*ئەگەر بینی ناتوانێ بەنێو دەریادا بڕوات بەکەشتیەوە بەڵگەیە لەسەر زیندانیکردنی لەلایەن کۆمەڵێکەوە لەگەڵ ئاڵۆزبوونی حاڵ‌وباری.
*ئەگەر بینی بەوشکانیدا دەڕواتو دارو درەختو شاخ‌و داخ دێتە بەردەمیو دەبن بەرێگر لەبەردەم ئەودا کەبەردەوام بێت لەرۆیشتن ئەو خەونە بەڵگەیە لەسەرگیرخواردن‌و ئاڵۆزی کاروبارەکانی.
*ئەگەر بینی لەسەر رۆخی دەریایەکەو کەشتیەك دەبینێ لەدەریادا بەهێواشی دەڕوات خێرە بۆسەرجەم خەڵکیو بەڵگەیە لەسەر سەفەر بۆیەکێکیش سەفەریکردبێ بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەواڵێك لەدەریاوە پێیبگات.
*ئەگەر گەلەکەشتییەکی بینی سەردەکەوێت بەڵگەیە لەسەر خێرێکی هێواش‌و لەسەرخۆ ، ئەگەر بینی دادەبەزێ خێرەکە خێرادەبێت.
*بینینی بەرێکەوتنی کەشتی بەڵگەیەلەسەر:
+ئایندااران.

+ئاڵۆزبوونی کاروبار.
+دەستگرتن بەسەر شتومەکدا.
+باوەڕهێنان.
*چارۆکەی کەشتی بەڵگەیە لەسەر کەشتیەوانێکی کاروبار ڕێکخەر.
*سەرنشینانی کەشتی بەڵگەیە لەسەر خزمەتگوزاران.
*سەوڵ بەڵگەیە لەسەر:
+بەڕێکەوتنی کەشتی.
+منداڵی خاوەن کەشتی.
*نێوەڕاستی کەشتی بەڵگەیە لەسەر خاوەنەکەی، شکانو درزو کونتێبوونی بەئەندازەی ئەوە دەبێت.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی سواری کەشتیەکبووە زیانی کتوپڕ ڕووی تێدەکات.
*ئەگەر شتێکی لەنێو کەشتیەکدا بینی گەنجو سامانە بۆ خاوەن ماڵو دارایيو هاوسەرگیرییە بۆ کەسی ڕەبەنو بەخششە بۆ یەکێك پەیوەندی هەبێت بەفەرمانڕەواوە.
*ئەگەر بینی لەنێو کەشتیەکدایەو ڕەشەبا هەڵیکردوەو دەریا لەحاڵی هەڵکشانو دابەزیندایەو خۆی لەنێو ئەو ئاڵۆزییەدا دییەوەو ڕەواندیەوە پلەوپایەی دەستەڵات بەدەستدەهێنێت لەگەڵ دەستەڵاتێکی تۆکمەو بەهێزو سەربازو خزمەتکاران لەحاڵی ئامادەیيو ئامادەنەبووندا بەگوێی دەکەن.
*ئەگەر بینی کەشتی بەنێو خوێندا دەڕوات بەڵگەیە لەسەر زینا، ئەگەر کەشتیەکەی شکاو پارچەکانی پەرشو بڵاوبوونەوە دایکی دەمرێ.
*ئەگەر بینی کەشتیەکی کڕیوەو ڕەبەنبوو هاوسەردەگرێ.
*سەوڵی کەشتی بەڵگەیە لەسەر زانیاری بۆ یەکێك ببینێ بەدەستی خۆیەوە.
*هەروەها دەڵێن: کەشتی ژنێکی قەڵەوە چونکە (عەرەب) ژنی قەڵەو بەکەشتی دەچوێنێ.
*کەشتی بەڵگەیە لەسەر (ئیسلام) کەمەردوم لەنەزانینو بەلاّو فیتنە قوتاردەکات.
*ئەگەر قوتابیەکی زانستپەروەر بینی کەشتیەکە چوەتە سەر وشکانيو بەسەریا دەڕوات لەزانیاریو بیدعەو مشتومڕو دووڕوویيو خراپە بەدەردەکەوێ.
*بینینی کەشتی بەڵگەیە لەسەر ترسو بیمو ئومێدو هیوا، ئەگەر سواریبوو خوازیاری قوتاربوونە بەهۆیەوەو دەترسێ نوقم ببێت.

*کەشتی بەڵگەیە لەسەر:
+حوشتر کەباری قورس هەڵدەگرێ.
+ئاسانبوونی کاروباری قورس‌وگران.
+دڵنیابوون لەترس‌و بیم.
+مزگەوت‌و بازاڕ.
+ئەمەکداری بۆ خانەوادەی پێغەمبەر(ﷺ).
+نادی‌و یانەی خواردنەوە کەمرۆڤ بەژێری دەچێتە نێوی‌و بەسەرخۆشی لێیدێتە دەرەوە.
*بەڵگەیەلەسەر مرۆڤ خۆی بەم شێوەیە:
+قاچەکانی قاچیەتی.
+سەوڵەکانی دەستێتی.
+چارۆکەکەی سەرێتی.
+دڵی ئەقڵ‌و ژیرییەتی کەوەردەگرێ‌و دەبەخشێ.
+پارچەکانی پەراسوەکانیەتی.
+ناواخنیشی ئەندامەکانیەتی.
+رەگ‌و دەمارەکانی پەت‌و گوریسە.
*هەروەها کەشتی بەڵگەیە لەسەر:
+خەوش‌و ناتەواوی تەندروستی.
+زیادبوونی زانیاری‌و پارێزراوی لەدوژمن.
*دەوڵەمەندی هەژارو راوەستانی کەشتی لەسەر چیایەك بەڵگەیە لەسەر پارێزراوی لەدوژمنان.

*رۆیشتنی کەشتی بەسەر وشکانیدا بەڵگەیە لەسەر قوتاربوون‌و پارێزراوی لەمەترسی‌و ناڕەحەتی.
*ئەگەر کەشتی رفی‌و بردیە نێو ئاسمان بەڵگەیە لەسەر مردنی‌و هەلگرتنی لەسەر دارەمەیت.
*ئەگەر لەنێو دەریادا نوقم بوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دۆزەخییە.
*ئەگەر کەشتیەکە بوو بەئاسن یان مس بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی ئەوەی بەڵگەیە لەسەری یاخود بەردەوامبوونی پشوودانی.
*ئەگەر هەندێکی ئاسنبوو هەندێکی دار گومان رووی تێدەکات.
*ئەگەر بینی کەشتی خوارد یاخود قووتیدا نرخەکەی دەخوات یاخود میراتیەکی زۆری بۆ دەمێنێتەوە یان گۆشتی گیاندارانی دەریا دەخوات.
*ئەگەر بینی کەشتیەکە گفتوگۆی لەگەڵدەکات بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دانایی بەدەستدەهێنێت لەخەڵکی نەفام‌و نەزان.
*بینینی کەشتی (نوح) (سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەیە لەسەر خۆشی‌و شادی‌و بارانبارین ، مەگەر ستەمکارین ئەوجا بەڵگەیە لەسەر نەبوونی‌و بەلاو نەهامەتی.



*هـەروەها کەشـتی(نـوح) (سـەلامی خوای لێبێت)بەڵگەیە لەسەر:

+دەروولێکردنەوە لەناڕەحـەتیو بـەڵاو نەهامەتی.

+پارێزراوی لـەنوقمبوون لـەدەریادا بـۆ ئەوەی لەسەفەردایە.

+پلەوپایـەی شـکۆمەندو سـەرکەوتن بەسەر دوژمناندا.

**کەشـتیگەر:** (نابلـسی) دەڵێـت: ئەوکەسـەیە هەڵدەسـتێت بەدروسـتکردنی کەشـتیو بینینـی بەڵگەیە لەسەر دەلاڵی ژنان.

**کەشـتیەوان:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: کەشـتیەوان زیندانەوانـە. هـەروەها وتراوە: بەڕێوەبەری کاروباری پادشایە یان وەزیرو بەر پرسی سـەربازەکانێتی یـاخود رێکخـەری کاروبـاری نێـوان هەردووکیانە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر حوشترو هێسترو گوێدرێژو ...

(نابلـسی) دەڵێـت: بینینـی لەخـەودا بەڵگەیە لەسەر:

+سەفەری دوور.

+ماڵو بازرگانی بەسوودو قازانج.

+تێکـەڵبوون لەگـەڵ زنجـیو رەشپێـستەکانو کەمەندکێـشکردنی دڵیان.

**کەشك:** (ئیبن سـیرین) دەڵێـت: کەشـك مـاڵێکی خـۆشو بەتامـە. دەگێڕنـەوە لەپێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) لەخـەودا بینیویەتی هـاتوە بـۆ (طـائف)و جامێ ماسـتیان بـۆ هێنـاوە ، خـستویەتیە نێـوان دەسـتیو رژاوە، حـەزرەتی ئەبوبەکر(ﷺ) بەچەشنێ لێکیداوەتـەوە وتویـەتی: وابـزانم ئەمـساڵ هیـچت لـە(طـائف) دەسـت ناکـەوێت، پێغەمبـەریش(ﷺ) فەرموویـەتی: بـەڵێ وایـە[1]، پاشـان پێغەمبـەر(ﷺ) تێدەپەڕێ.

*پیاوێـك هـات بـۆ لای (ئـیبن سـیرین) وتی: جامێ شیریان بۆ هێنـام ، پاشـان جـامێکی تریـان هێنـاو قڵپیـانکردەوە نـاوی، ئینجـا مـنو هاوڕێکـانم دەسـتمانکرد بـەخواردنی لەسـەر توێژەکـەی ، پاشـان گـۆڕا بۆسـەری حوشـتر ئێمـەش بەهـەنگوین دەمـانخوارد. ئـەویش وتـی: شـیرەکە پاکێتییـە، ئـەوەی قڵپکرایـەوەنێویو زۆریکـرد فراوانبـوونی پاکێتییـە، خـواردنی سـەرتوێژیش پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً﴾(الرعد: ١٧).

---

[1](ابن هشام) له (السيرة النبوية) : (٤/١١٠ ـ ١١١) بەم چەشنە، هەروەها (ابن كثير) لـە (البـداية والنهاية) ٤/٢٥٠ له (ابن اسحاق)ەوە بەڕاگەیاندن.

سەبارەت بەحوشتر پێناسێکی (عەرەب)ەو، هیچ شتێکیش ئەوەندەی سەری حوشتر مەزنتر نییەو، سەردارانی (عەرەب)یش پێشەوای باوەڕدارانەو ئێوە غەیبەتی دەکەن‌و لەگۆشتەکەی دەخۆن.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: کەشك ڕزق‌و ڕۆزییە بەماندبوون‌و نەخۆشی دەستی دەکەوێت، دۆینە ئەگەر چەوری تیابوو بەڵگەیە لەسەر بازرگانیەکی پیس بەسوودێکی زۆرەوە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا غەم‌و پەژارەیە ، تریتی دۆینە بازرگانیەکی بەسوودە بەڵام بۆگەنە.

**کەشیش( مالوم ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر باوەڕو وازهێنان لەدنیاو گومان، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەو ئیمامەی لەزانیاریدا پابەندی وتەکانیدەبن‌و یاخود دانایەك لەراوبۆچوونی دووریبخەنەوە.

*کەشیش پیاوێکی لەخۆبایی خاوەن قسەی پڕوپووچ‌و نادروستە بۆ خۆی.

*ئەگەر بینی بوە بەکەشیش یاخود دەگات بەپلەو پایەی ئەوان بەڵگەیە لەسەر خێر بۆسەرجەم خەڵکی‌و بەڵگەی ناوبانگ‌و شکۆدارییە.

*ئەگەر بینی قسەی قەشەکاندەکات شتەپڕوپووچەکانی دنیایەو بەراست

دانانی ئەوە لەخەوو کاتی بێداریدا نەزانینە لەئایندا.

**کەف ـ توێژ( کەفی سەرئاو ):** لەخەودا منداڵێکە لەسکی دایکیدایە، کەف ماڵێکی جەمکراوی خۆش‌و بەتام‌و سوودمەندە لەگەڵ ڕزق‌و ڕۆزی‌و قازانج.

*هەروەها دەگوترێ ئەوەی کەف بخوات خوداوەند سەردانی خاکی پیرۆزی پێدەبەخشێ.

*کەف بەڵگەیە لەسەر:

+فەڕوخێرو شێ‌و بژێی‌و سوودو قازانج.

+سووکی‌و سانایی ئەوەی داوایدەکات‌و لەکاتی بێداریدا چارەسەریدەکات.

*کەفی سەرئاو بەڵگەیە لەسەر شتێك هیچ سوودێکی لێوەرناگیرێ.

*کەف بێسوودو قازانجە ، خاوەنەکەی پێی سەرسامدەبێت، ئەگەر بینی کەف‌و توێژی دەستکەوت شتێکی بێکەڵك‌و سوود بەدەستدەهێنێت.

**کەفارەت:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر قەرزدانەوە لەرۆژوو (حەج)و خێرو ماڵ‌و سامان کەدەکەوێتە ئەستۆوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر غەرامە چونکە خواردن‌و پۆشاکی تێدایە.

**کەڵەشاخ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی کەڵەشاخی لێدەگیرێ یان کەڵەشاخ بۆیەکێك دەگرێ دەستەڵاتێك

بەدەستدەهێنێت یاخود ئەمانەتو ئەسپەردەیەکی پێدەسپێردرێ یان نوسراوێکی مەرجدار دەنووسێت یاخود ژن دەهێنێت چونکە گەردن وەك ئەمانەتو ئەسپەردە وایە.

*ئەگەر کەڵەشاخگرەکە پیاوێکی پیرو بەتەمەن و ناسراوبوو هاوڕێی دەبێت، ئەگەر لاوێکبوو دوژمنی دەبێت نووسراوێکی مەرجداری قەرزی لەسەر تۆمار دەکات.

*ئەگەر کەڵەشاخی لەلاوێك گرت زەفەر بەدوژمنەکەیدەبات.

*هەروەها دەڵێن: کەڵەشاخ رەواندنەوەی نەخۆشیو پەتایە، یان کەمو کوڕی ماڵو دارایییە.

*ئەگەربینی کەڵەشاخگر کەڵەشاخی لێدەگرێت ماڵو دارایی لەکارێکی بەسوودو قازانجدا خەرجدەکات، ئەگەر کەڵەشاخیگرتو خوێنی لێنەهات ماڵو داراییەکی شاردوەتەوەو ناچێتەوەسەری، یان ئەسپەردەو ئەمانەتێکی سپاردوە بەیەکێكو نایداتەوە، ئەگەر لەبری خوێن بەردی لێهاتەدەروە ژنەکەی لەیەکێکیتر منداڵی دەبێتو ئەویش ئەو منداڵە پەسەند ناکات، ئەگەر کەرەستەی کەڵەشاخەکە شکا ژنەکەی تەلاق دەدات یان دەمرێت.

*ئەگەربینی کەڵەشاخدەگرێ سوودو قازانج بەدەستدەهێنێت یاخود پێکاندنی سوننەتە، یان قوتاربوونە لەناڕەحەتیو ناسۆری.

*دەگێڕنەوە: (یەزید)ی کوڕی (موهەلەب) لەزیندانی (حەجاج)دا دەبێت لەخەودا دەبینێت کەڵەشاخدەگرێو دواتر لەزیندان قوتار دەبێت، هەروەها (معن)ی کوڕی (زائدە) دەبینێ لەخەودا کەڵەشاخدەگرێو چادرو دەوارەکەی خوێناوی دەبێت کاتێ بەئاگادێت دوو رش پێست دێنە لایو دەیکوژن.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر شوێنەواری کەڵەشاخەکەی بەئەستۆیەوە بینی گەواهی دەدەن لەسەری، ئەگەربینی کەڵەشاخ لەمرۆڤێك دەگرێو کەڵەشاخگر وانییە لەغەمو پەژارە قوتاردەبێت یان لەترسوبیمکردن لەمرۆڤێك رزگاریدەبێت.

*کەڵەشاخگرتن خواردنی دەرمانێکی تاڵەو ئارامگرتن لەسەری وەك ئارامگرتن لەسەر نەشتەر هەتا لەشساغ بێت.

*ئەگـەر ژنێـك كەڵەشـاخى لێگـرت ئازاریدەدات.
*دەگونجێت كەڵەشاخگرتن ژارێك بێت لەخوێن بێتەدەرەوە.
*ئەگـەر كەڵەشـاخى لەكەسـێككرتو لەبنـەڕەتا لێیدەترسـا دڵنیادەبێـت لەشەڕو خراپەی.
*دەگونجێت كەڵەشاخگرتن بەڵگەبێت لەسەر ماڵوساماني حەرامو نادروستو بەخشین لەگەڵ كەڵەشاخ لێگیراودا.
*ئەگـەر یـەكێكیان بـەڕۆژوبێت هـەردووكیان ڕۆژوو دەشـكێنن یـاخود كردارێـك ئەنجامـدەدەن ڕۆژوەكـە بەتاڵدەكاتەوە.
*ئەگـەر خەوبینـەر كەڵەشـاخیگرت بـۆ لابردنی ژانەسەرو ئێشى چاو بەڵگەیە لەسەر چارەسەرو تەندروستی.
*ئەگـەر لەخـەودا خـوێنى خـواردەوە بەڵگەیەلەسەر:
+كاروكاسبى حەرام.
+غەیبەتكردن.
+ڕێگریو بێدەنگی لەوەڵامدانەوەدا.
**كەڵەشـاخگر:** (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: كەڵەشاخگر پیاوێكە دەستەڵاتی بەسەر ئەستۆو گەردنی خەڵكیدا دەڕوات وەك دەسـتەڵاتدارو زانـاو فـەرمانڕەواو پزیشكو پسوولەوان.

*ئەگەربینی كەڵەشاخگرێك كەڵەشاخی لێدەگرێ تەماشـای حـاڵى خۆیـدەكات ئەگـەر خـوێنی لێـداوابكرێت یـان لـەجیهاددابێت دەكوژرێـتو خـوێن لەگەردنی دەڕژێت.
*ئەگەر نـەخۆش بێـت لەسـەر دەسـتی پزیشك چاكدەبێتەوە.
*ئەگـەر قـەرزاربوو دەبـوو ئەمانـەتو قـەرزێك بداتـەوە لەسەردەسـتی دادوەرێـك بیداتـەوە، ئەگـەر خوازیـاری هاوسـەرگیری بێـت ژنێكـدەهێنێتو مەرجەكانی دەخاتە ئەستۆی خۆی.
(نابلسى)دەڵێت: كەڵەشـاخگر لەخـەودا پیاوێكـە پـسووڵە لەسـەر خـەڵكی تۆماردەكات.
*بینینـی كەڵەشـاخگر بەڵگەیەلەسـەر ڕەواندنەوەی غەمو پەژارەو نەخۆشی.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسـەر زەرەر دوای سوودو قازانج.
*ئەگـەر لەخـەودابوو بەكەڵەشـاخگر یـاخود یـەكێك لەكەسوكارەكـەیبوو كەڵەشـاخگر دەگونجێـت هۆكارەكـانی بەهەنـدبیگرێ یـان سەرپێـچی دایكـی بكـات یـاخود ئـەوەی كەڵەشـاخی لێگرتووە.
**كەڵەشـێر:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: كەڵەشـێر لەلێكدانـەوەدا بەنـدەو

کۆیلەیەکی خاوەنداره ، هەروەها مریشکیش وایه چونکه لای مرۆڤ وەك کۆیلەن و نافڕن.

*هەروەها کەڵەشێر بەڵگەیە لەسەر:

+پیاوێکی ئیرادەو خواس بەرز.

+دەنگی وەك بانگدەروایە.

+دەستەڵاتدارێك لەژێر فەرمانڕەوایی کەسێکی تردابێت چونکه وێڕای گەورەیی و ریش و پۆپنەی ماڵییەو ناتوانێت بفڕێت و خاوەنداره.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر کەڵەشێرێك ببڕێت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی وەڵامی بانگبێژ ناداتەوە.

*هەندێکیتر دەڵێن: ئەگەر بینی بوە بەکەڵەشێر زوو دەمرێت.

*کەڵەشێری بچووك خاوەنداره یاخود منداڵی خاوەنداره، هەروەها بارۆکەش بەو چەشنەیەو پۆلە باڵندەش تالانی و ماڵ و دارایی دەستبەسەراگیراوە.

(عومەر)ی کوڕی (خەتتاب) (رەزاو رەحمەتی خوای لێبێت)دەڵێت: کەڵەشێرێکم دی دەنووکی یان دوو دەنکوی لێدام یاخود گوتی سێ دەنووك ، ئەم خەونەی گێڕایەوە بۆ (ئەسما)ی کچی (عومەیس)و ئەویش وتی: کۆیلەیەکی عەجەمی دەتکوژێت.

*پیاوێك هات بۆ لای (ئەبی عون)ی (زەراب)و وتی: بینیم وەك کەڵەشێرێکی گەورە لەبەر دەرکی ماڵی تۆدا دەیخوێند، ئنجا (ئەبی عەون) هات بۆلای (ئیبن سیرین)و ئەم خەونەی بۆ گێڕایەوە، (ئیبن سیرین) پێی وت: ئەگەر خەونەکەت راستبێت تۆ دوای سی و چوار رۆژ دەمریت ، ئەویش ئالوودەی خواردنەوەبوو وازی لێهێناو تەوبەیکرد پاشان لەناکاو مرد هەروەك (ئیبن سیرین) ئاماژەی پێکرد، ئنجا له(ئیبن سیرین) یان پرسی چۆن ئەو لێکدانەوەیەت لەخەونەکە هەڵهێنجا؟ وتی: لەژماردنی(جمل) چونکه(دال) چوارەو (یا) دەیەو (کاف) یش بیستە.

(نابلسی) دەڵێت: کەڵەشێر خاوەن ماڵە، هەروەها کۆیلەو بەندەیە.

*هەروەها دەڵێن: کەڵەشێر منداڵێکی خاوەن خۆشەویستییە ئەوەی بیبات چاکبوونی نێوان خۆی و کەسێکیترە.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی کەڵەشێر لەخەودا ببینێ دانایی و دانیشتن لەگەڵ زانایاندا ئەنجامدەدات و سوودیان لێوەردەگرێ.

*ئەگەر کەڵەشێرەکە سپیبوو بانگبێژە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو کەسەی فەرمانبەچاکە دەکاتو خۆی جێبەجێی ناکات چونکە باسی نوێژ دەکاتو خۆی بەجێی ناگەیەنێت.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پیاوێك ژن زۆر بهێنێت یاخود دەلالێکی دەنگبەرزو قاوقیژکار.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+پیاوێکی رێزدارو بەخشندە بۆ خۆی یاخود بەقەناعەت.
+یەکێك زۆر بکەوێتە ناڕەحەتیو دەردەسەرییەوە.
+تۆوی هەموو شتێك.
*ئەگەر کەڵەشێرێك ببینێت دەچێتە نێوماڵەکەیو دەنکە جۆکان دەخوات بانگبێژ دزییەکی لێدەکات.
*ئەگەر ببێ بەخاوەنی کەڵەشێر کوڕێکی پێدەبەخشرێو بژێویو رزقو رۆزی دەڕژێت بەسەریا یاخود کەسێکی ئاوارەی دەگەڕێتەوە یان هەواڵێکی ئەو کەسە دەگات ئەوەی کەڵەشێرەکە بەڵگەیە لەسەری وتاربێژە یان دەلالە یاخود بانگبێژە یان پاسەوانە.
*ئەگەر دەنووکی گرت لەمرۆڤێك یان بەسنگی نیگەرانیکرد ناڕەحەتی رووی تێدەکات.

*ئەگەر کەڵەشێرێکی سوور بپێکێ خزمەتکارێکی خراپەکار بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر بینی دەجەنگێ لەگەڵ کەڵەشێرێکدا کێشمەکێش لەگەڵ پیاوێکی عەجەمیدا ئەنجامدەدات، ئەگەر زیانێکی لەلایەن کەڵەشێرەوە پێگەیشت لەو پیاوە عەجەمییەوە خراپەیەکی پێدەگات بەئەندازەی ئەوەی کەڵەشێرەکە پێیدەگات.
**کەمتیار:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ژنێکی خراپەکاری ناقۆڵایەو گێلو جادووگەرو پیرە، ئەگەر تیرێکی تێگرت قسەو نامە لەنێوانیاندا دەبێت، ئەگەر بەردی تێگرت یان بوندوقێك ئەگەر برینداریکرد یان گەر بەشمشێر لێیدا زمانی درێژدەبێ بەسەریا، ئەگەر گۆشتەکەی خوارد جادووی لێدەکرێ پاشان چاکدەبێتەوە.
*ئەگەر شیرەکەی خوارد ناپاکیو خیانەتی لەگەڵدەکرێو هەموو پێستو ئێسقانەکەی ماڵو داراییە.
*کەمتیاری نێرە دوژمنێکی ستەمکارەو زۆر پلانو فرۆفێڵدەکات، هەروەها دەڵێن: ئەوەی سواری ببێت دەستەلات بەدەستدەهێنێت.یان دەڵێن: بەڵێنو ملکەچیو بێبەشکردنە.

*هەروەها دەڵێن کەمتیاری مێینە ژنێکی ناڕەسەنە.
(نابلسی) دەڵێت: کەمتیار لەخەودا دوژمنێکی ستەمکاری پلانگێڕە کاروبارەکانی بۆ دواوە دەگەڕێنەوە، ئەگەر سواریبوو ژنێکدەهێنێ.
*کەمتیاری شەل بەڵگەیە لەسەر ژنێکی جادووگەرو ژنی پیاوێکی نادیار کەخاوەنی هیچ رەچەڵەکێك نییەو نەناسراوە.
*هەروەها کەمتیار بەڵگەیە لەسەر خەڵکی بێکارەو دەستبڕ.
*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر دەرخستنی نهێنیو خۆهاویشتنە نێو ئەو باسانەوە کەپەیوەندی نییە، پێوەیو کەمتیاری مێیەش هەریەو شێوەیەیە.
*دەگونجێت کەمتیار بەڵگەبێت لەسەر نێرەموك.
*ئەگەر کەمتیار بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرو کچ ناشیرینو ناقۆڵایە.
**کەموکوڕی:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی کەموکوڕی لەخەودا بۆکەسی دەستڕۆیشتوو بەڵگەیە لەسەر سەرتاشینیو، کەموکوڕی لەئیشوکارداو بەهانە وەرگرتن.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: بینینی کەسێکی ناتەواو ئەگەر لەئەندامەکانیدابوو بەڵگەیە لەسەر کەموکوڕی لەماڵو نازو نیعمەتدا.
**کەمۆڵە( شووشە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کچ یان کوڕە، هەروەها دەڵێن: ژنە بەپێی گوفتاری پێغەمبەر (ﷺ) "نەرمو نیان بن لەگەڵ شووشەئاساکان"[1].
(نابلسی) دەڵێت: کەمۆڵە ژنێکە نهێنی ناپارێزێ یاخود هاوڕێیەکی فیتنەیە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنێکی داوێنپیس بۆ هەریەکێك ئاو لەکەمۆڵەیا دابنێ.
*ئەگەر کەمۆڵەیەکی بینی رۆنی تێدابوو کەمۆڵەکە ژنەو رۆن جوانییەتی، ئەگەر لەو چەورییەی سەری چەورکرد جوانییە بۆی، ئەگەر بەئەندازەیەکی گونجاوبوو، ئەگەر رۆنی لێچۆڕا غەمو پەژارە رووی تێدەکات.
*دەفری شکاو ماڵو داراییە، ئەگەر بینی شتێکی لێهەڵدەگرێ ماڵو سامانە.
*کەمۆڵەی مەیوبادە خزمەتکارێکی سوودڵە لەگواستنەوەی ماڵو دارایيدا.

---

[1](بوخاری) لە (الادب) دا (٦٢٠٩) لەفەرموودەی (ئەنەس)ی کوڕی (مالیك)ەوە هێناویەتی.

*دەگونجێت کەمۆڵە بەڵگەبێت لەسەر پیاوی فرە رەگەز.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دووزوبانیو کەوتن بەسەر نهێنی ئەوانەی بێنەمەكو خۆشەویستنین.

*ئەگەر بینی کمۆڵەیەك شکا ماڵەکەی لەکیسدەچێت.

**کەمۆڵەی عەتار:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: کەمۆڵە هەلگرو پارێزەرە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاو یا ژنێکە نهێنی خەڵکی دەپارێزنو ئەسپەردەو ئەمانیش پارێزگاری لێدەکەنو بەخێرو چاکە دایاندەپۆشێ.

**کەمەربەند:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر توندوتیژی لەکاروبارو قورسیوگرانی مەگەر خەوبینەر لەهەڵوێستێکدا پێویستی بەپشتگیری هەبێت ئەوجا بەڵگەیە لەسەر گەیشتن بەپلەوپایەو بەدەستهێنانی پێداویستی.

(ئیبن سیرین)دەڵێت کەمەربەند باوكو براو مامو کورە ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی سەرکردە پشتی پێدەبەستێ لەکارێکدا.

*ئەگەربینی بەرپرسێك کەمەربەندێکی دایەو لەناوەڕاستدا داینا بەڵگەیە لەسەرئەوەی نیوەی تەمەنی ماوەتەوە.

*ئەگەر کەمەربەندەکە زێڕی تێدابوو ئەو خشلانەی ناوچەکە دەویتی فەرمانرەوانو بوونیشیان لەژێر تاریکاییە، ئەگەر لەئاسنبوو هێزی سەربازەکانیەتی، ئەگەر لەقوڕقوشمبوو لاوازییانە، ئەگەر لەزیوبوو دەوڵەمەندیانە.

*ئەگەر دووناوچەی لەئەستۆدابوو یان زیاتر بەڕادەیەك نەیدەتوانی کاروبارەکانی ببات بەڕێوە خاوەنەکەی تەمەندرێژ دەبێتو پیری رووی تێدەکات.

*ئەگەربینی کەمەربەندێکی پێدراو بەدەستی راست وەریگرتو کەمەری خۆی پێنەبەست، سەفەرێکدەکات، ئەگەر بەدەستی چەپیبوو بەدەستی راستیش قامچییە دەستەڵات بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر کەمەربەندی دەستەڵاتدارێك بچڕا هێزو تواناو دەستەڵاتی بەهێزدەبێو تەمەندرێژیش دەبێت.

*ئەگەر ناوقەدی خۆی بە بەکرەیەك پێچا نیوەی تەمەنی بەسەرچوە، ئەگەر بەمارێك ناو قەدی بەست تورەکەی درهەمو دنیار لەپشتی توندەکات.

*هەروەها وتراوە: ئەگەر پادشاو فەرمانڕەوایەك کەمەربەندێکی دایە مولكو دەستەڵات بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر کەمەربەندێکی بەبێ خشڵ بەخۆیەوە بینی پشت بەپیاوێکی بەرێز دەبەستێ هێزو خێرو نازونیعمەتی دەستگیردەبێ ، ئەگەر دەوڵەمەندبوو هێزو پارێزگارییەتی لەگەڵ خۆڕاگری لەسەریازەکانیو دەستەلات پەیداکردنی ماڵی حەلاڵو نهێنی باشتر دەبێت لەئاشکراو دیاری.

*کەمەربەندی نادیار پشتی مەردومە، ئەگەر لەناوەڕاستەکەیدا زێڕی تێدابوو ماڵو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێ یاخود کوڕێك خانەوادەکەی دەبات بەڕێوە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر ناوقەدی بەکەمەربەند توندکرد ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت یاخود دەستەلاتی بەهێز دەبێ.

*ئەگەر کەمەربەندەکە بەزێڕ رووکەشکرابوو زێڕەکە بۆ فەرمانڕەوا نویتییە بۆیدەکەن.

*ئەگەر کەمەربەندێکیان دا بەدەستی راستی وەریگرت بەڵام نەیکردە پشتی سەفەرێك دەکات، ئەگەر بەدەستی چەپیبوو بەڵام دەستی راستی قامچی تێدابوو دەستەلاتە.

*ئەگەر کەمەربەندێك بەدەستی راستییەوەبوو دەستی چەپیشی شتێکی سووربوو ئەوە هێزە لەگەڵ خۆشیو ئارەزوو.

*ئەگەرپشتی پێبەست بەلام پچڕا لەکارەکەی لادەبرێ ئەگەر دەستەلاتداربوو یاخود لەگەورەکەی دووردەکەوێتەوە ، ئەگەر لەوانەبوو کەدەدرایە پاڵ سەرۆکایەتی ئەگەر چوبوە ساڵەوە دەمرێ.

*ئەگەر کەمەربەندەکەی پچڕا رەوانبێژ دەبێت، ئەگەر خوازیاری کوڕبوو پێیدەدرێت، ئەگەر ترس‌وبیمی هەبوو یان نەخۆشبوو چاکدەبێتەوە.

*دەگونجێت کەمەربەند بەلگەبێت لەسەر سواربوونی ئوتومبیلو پاسکیلو ئاژەڵی پۆستەچی.

*هەروەها بۆبێکار خزمەتە یان ژنە یاخود زۆری منداڵە بەتایبەت ئەگەر ئەڵقەی زۆری تێدابوو.

**کەنداو:** لەخەودا شوێنکەوتەو دەرگایە ئەگەر لەوادەو کاتێکدا زیادیکرد دەریا کەمدەکات.

*بەلگەیە لەسەر ناویانگو چاکەی خێرۆمەند.

*رێگەی میانڕەوەییە.

*پیاوێکی بڕێوو دەرامەت مام ناوەندە.

*کەنــداو ئــاین و چــاکێتیە بــەهۆی گونجـانی حـەزو ئارەزووەکـانی لەگـەڵ بەندایەتی و خواناسی.

**کـەنیزەك:** لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر بازرگـانی بۆیـەکێك بیکرێـت یـان لێـی نزیکببێتەوە.

*کــەنیزەك کاروبــاری بــەرێوەبراوە ئەوەی بەسەرچوە یان دێت.

*ئەگـەر کـەنیزەکێکی رازاوەی بینـی هــەواڵێکی ناخۆشدەبیـستێ، ئـەوەی کەنیزەکێکی دەموچاوگرژ ببینێ غـەم و پەژارە دێت بەسەریا.

*ئەگـەر کـەنیزەکێکی رووت و قـووتی بـەدیکر لەکاروکاسبیدا زەرەردەکـات و ئابرووی دەچێت.

*ئەگـەر بینـی دەچـێتە لای دەبێـت بــەخاوەنی زەوی و زارو بازرگانیەکـەی بەسوودد ەبێت.

*کـەنیزەك هەواڵـە بـەپێی جـوانی و جل وبـەرگی خۆئەگـەر کـەنیزەکێکی داپۆشراوبوو هـەواڵێکی پەنهانـە لەگـەڵ دینداریدا، ئەگەر کەنیزەکێکی رووتبـوو هەواڵەکە بەناوبانگـە، ئەگـەر دەمـامکی بەسـتبوو هەواڵەکـە تێکەڵ وپێکەڵـە، ئەگـەر دیـاربوو هــەواڵێکی بـڵاوە، کـــەنیزەکی مـــەمککردوو هـــەواڵیی خوازراوو جێی ئومێدە.

**کەنیسە( دێر ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت::
کنیسە بەڵگەیە لەسەر:
+گۆڕستان و ماڵی سوزانی.
+فرۆشگای بادەو مەی.
+وڵاتی بێباوەران.
+بیدعە.
+شوێنی لێدانی مۆسیقا.
+گۆرانی.
+ماڵی پرسەو هاوارو شیوەندار.
+ دۆزەخ.
+زیندان.

*ئەگەر خۆی لە(کەنیسە)یەکدا دییەوە ئەگەر یادوزیکری خـودای تێدا دەکـرد یـان دەگریـا یـاخود نوێژیـدەکرد رووی کردبـوە (کابـە) دەچـێت بـۆ سـەردانی مـــردوو یـــان نوێـــژ لەســـەر مردوویەکـدەکات، ئەگـەر گریانەکـەی بـەهاوارو لالآنـەوەبوو شـتێکی تێـدابوو بەڵگـەبێت لەســەر غــەم و پــەژارەو دەگیری و زیندانید ەکرێ.

*ئەگـــەر مردوویـــەکی تێـــدابینی لەئاگردایە لەگەڵ سەرپێچیکاران.

*ئەگەر زینـدوێتی چـوەنێوی و بانگیـدا یــــان قورئانیخوێنــــد ئەگــــەر لەتێکۆشـاندابوو سـەردەکەوێ بەسـەر وڵاتی دوژمندا لەگەڵ ئەوانیتردا.

*ئەگەر لەشاربوو چوە لای خانەوادەو کەسەکانی خەریکی بیدعەو سەرپێچیین.

*ئەگەر لەگەڵ ئەواندابوو وەك ئەوانیش نوێژیکردو سەرجەم کردارەکانی وەك خۆیانبوو ئەگەر پیاوبێت تێکەڵ بەخانەوادەو خزمەکانی دەبێ لەکاتێکدا بێباوەڕن‌و گوناهی گەورە ئەنجامدەدەن بەتایبەت ئەگەر کڕنووشی بۆ خاچبرد.

*ئەگەر ژنبوو ئامادەی شاییەك دەبێ رەشبەڵەك‌و دەهۆڵی تێدا لێدەدرێ یان ئامادەی پرسەو مەرگی کەسێکدەبێ ژنانیان سنگیان شەقدەکەن‌و دەمووچاویان دەڕنن‌و هاوارو قیژە دەکەن.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بۆ خاوەنی خۆی بەڵگەیە لەسەر:

+زانیاری.

+دنیانەویستی.

+ترسان‌و گریان لەبەرخوا.

+غەم‌وپەژارە.

+درۆو بوختان‌و توهمەتبارکردن.

+بیدعە.

+لانەی ستەم‌و گاڵتەو گۆرانی.

+ئالوودەبوونی یەك لەسەر مێزی خواردنەوەو کاری خراپ ئەنجامدان لەگەڵ هاوسەری یەکتردا.

+دادوەری ستەمکار.

*ئەگەر کەسێکی رەبەن خۆیکرد بەکەنیسەیەکدا هاوسەردەگرێ یان کوڕێکی پێدەبەخشرێ یاخود سەرگەردان دەبێ دوای رێنومایی بەتایبەت ئەگەر کڕنووشیبرد بۆ پەیکەرو بت یاخود ماچیکرد یان لەقوربانیدا هاوبەشیکردن بەلاّم ئەگەر تێیدا یادی خودایکردەوە فەرمان بەچاکەدەکات‌و رێگری لەخراپەو کەسێکە بەپێی توانای خۆی.

*دەگونجێت کەنیسە بەڵگەبێت لەسەر شوێنی شەیتان وەك زبڵدان‌و حەمام.

*نوێکردنەوەی کەنیسەو بەرزبوونەوەی بەڵگەیە لەسەر لاوازی ئاین‌و ملکەچی موسوڵمانان.

*ئەگەر کەنیسەیەکی بینی رووخێنراوە یان سووتاوە یان بەلاّو نەهامەتییەك رووی تێکردووە بەڵگەیە لەسەر بەرزی باوەڕو ملکەچی‌و رسوایی هاوەڵپەیداکارو دووڕوان.

*کەنیسە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەڵدەستێ بەئەرکەکانی لەمەسیحی

یان ئەو ئەرکەی بەجێی دەهێنێ لەراگرتن‌و وەستان.
*ئەگەر لەکەنیسەیەکدا جوولەکەی بینی ئاینی هەمان ئاینی ئەوانە.
*ئەگەر بینی ماڵەکەی خۆیبوە بەکەنیسە وتەکانی رووبەرووی وتەی ئەوان دەبێتەوەو ماڵەکەشی دەبێ بەلانکەی ئارەزووبازو بیدعەکارو سەرپێچیکاران‌و دەگونجێت گەورەکەی لێی توڕەببێ.
(نابلسی) دەڵێت : بینینی لەخەودا بەلگەیە لەسەر رەواندنەوەی غەم‌و پەژارەو ناڕەحەتی‌و قوتاربوون لەتەنگەژە ، ئەگەر خەوبینەر نەخۆشبوو دەمرێت.
**کەو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ژنێکی شۆخ‌و شەنگی رانەهاتوە.
*هەروەها دەڵێن: گۆشتی کەو جل‌وبەرگە، ئەگەر کەوێکی زۆری راوکرد ماڵ‌و داراییەکی زۆر بەدەستدەهێنێ لەدەستەڵاتداران.
*هەروەها دەڵێن: بەدەستهێنانی کەوێك بخوێنێ یا گرتنی هاوەڵایەتی کۆمەڵێکی رەوشتبەرزی دەم بەخەندەو پێکەنینە.
*هەروەها دەڵێن: پۆڕەکەوێ ژنانە.

**کەوان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: شکانی کەوان نەتوانینە لەبەئەنجامگەیاندنی پەیام.
*تیر بۆ ژن هاوسەرەکەیەتی‌و تیرەوانەکانیش هەروایە.
*ئەگەر بینی تیردانێکی پێدرا دەستەلات بەدەستدەهێنێ.
*هەروەها دەڵێن: تیردان ژنێکی پارێزگاریکارە یان هەیبەتە لەلایەن دوژمنەوە.
*تیردان دەستەلاتە بۆ دەستەلاتداران.
*تیرهەڵدان قسەو وتەیە لەنامەدا، کەوان ژنێکە زوو منداڵی ببێت یان برایە یاخود سەفەرە یانزیکبوونەوەیە لەخوداوەند.
*کەوان لەبەرگەکەیدا منداڵی نێرینەیە لەسکی دایکیدا.
*کەوان لەگەڵ چەکیتردا دەستەلات‌و شکۆمەندییە، ئەگەر ژنەکەی کەوانێکی پێدا کچی دەبێت، ئەگەر ژنێکیدی کەوانێکی پێدا کوڕیدەبێت.
*درێژکردنی کەوان بەبێ تیر سەفەرە.
*ئەگەر بینی کەوانێکی درێژکرد روودەکاتە پیاوێکی بەرزو سەفەردەکات بۆلایەکی بەرێزەوە.

*بچڕانی تاڵی کەوان بەڵگەیە لەسەر کۆسپو بەربەست کەوتنە نێو سەفەرەوە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر تەڵاقدانی ژن.
*بچڕانی کەوان بەڵگەیە لەسەر مەرگی ژن یا کوڕ یان شەریك یاخود هەندێك لەخزمەکانی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەستەڵاتو بچڕانو شکانی لابردنییەتی.
*قورسی کەوان بۆ ئەوەی لەسەفەردایە ماندوبوونەو، بۆ بازرگان زەرەرەو بۆ کوڕ ئازاردانی دایكو باوکەو بۆ ژن دەرچوونە لەگوێڕایەڵی مێردو سووکیو ئاسانی بەڵگەیە لەسەر ڕێگری.
*ئەگەر تیرێکی لەکەوانەوە هەڵداو نیشانەکەی پێکا دەگات بەویستو خوازی خۆی، دەگونجێت بینینی کەوان بەڵگەبێت لەسەر نزیکبوون لەهەندێك لەرێزدارانەوە بەپێی ئایەتی: ﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى ﴾(النجم:٨).
*درێژبوونی کەوان بەبێ تیر سەفەرە بۆ شوێنێکی دوورو گەڕانەوەیە بەباشی.

*ئەگەر تاڵەکانی کەوانەکە بچڕا لەو شوێنەی دەچێ بۆی سەفەر دەکات، ئەگەر گەیی پێی ، ئەگەر کەوانەکەی شکا بەڵاو نەهامەتی لەرێی دەستەڵاتدارەوە پێیدەگات بەفەرمانو رێگری ئەو.
*هەڵدانی بۆمب جنێوپێدانییەتی.
*ئەگەر کەوانێکی هەڵگرت کوڕێکیدەبێو دەستەڵاتی زیاد دەکات.
*ئەگەر بینی کەوانێك دەتاشێو رەبەنبوو خوازیاری هاوسەرگیریبوو هاوسەردەگرێ، پاشان دوای بەیەکگەیشتنی لەگەڵ هاوسەرەکەی دووگیاندەبێ.
*ئەگەر دەستەڵاتێکی پێدرا بەگوێی ناکەن.
*کوڕێك بەکەوان بچوێنرێ خاوەن کتێبو نووسیندەبێ، ئەگەر کەوانەکەی درێژکردو هەڵیداو تیرەکە رۆیی دەستەڵاتێك بەدەستدەهێنێتو فەرمانەکانی بەدادپەروەرانە جێبەجێدەکرێ.
*ئەگەر کەوانێکی شکاوی بەدەستەوە بینی ژنێکی سەربەستو ئازاد دەکات بەهاوسەری خۆی.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی کەوانێکی درێژکردو بەدەستییەوە دێت تەمەنی درێژدەبێ.

*ئەگەر مشتۆی کەوانەکەی بینی شکا بەڵگەیە لەسەر شکانی دەستی ئەوەی کەوانەکە بەڵگەیە لەسەری لەهاوڕێو شەریك یان براو کوڕ.

*ئەگەر دەستەڵاتداری بینی کەوانێکی پێدا یان لەنێوان خۆیو فەرمانڕەوادا دووکەوانی بینی پلەوپایە بەدەستدەهێنێت، لەگەڵ دەستەڵات بەسەر کۆمەڵێکدا بەپێی ئایەتی: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى﴾ (النجم:٩).

*هەروەها دووکەوان بەدوو دەرگاوان لێکدەدرێتەوە.

*ئەگەر کەوانەکەی شکا سەفەردەکاتو ئنجا بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە.

*دەگونجێت هەڵدانی تیر قسەی پووچو بەتاڵبێت یان قسەی حەقو راستی بەئەندازەی هەڵدانی رمەکان بڕوات.

*ئەگەر بینی کەوانێك دەتاشێ دەستەڵاتێك بەدەستدەهێنێ یان هاوسەردەگرێ یاخود کوڕێکی پێدەدرێ.

*ئەگەر بینی کەوانێك دەجوولێنێ بەڵام بەپێی ویستی خۆی نایەت ئەوەی کەوانەکەی دەدرێتەپاڵ کاروبارەکانی قورسوگران دەبنو زاڵدەبێ بەسەریا، ئەگەر تیرێکی هەڵدا بڕیارو رێگریەکانی جێبەجێدەکات ، ئەگەر نیشانەکەی پێکا لەدەستەڵاتەکەیدا لەسەر حەقو دادپەروەرییە، ئەگەر نیشانەکەی نەپێکا ستەمدەکات لەدەستەڵاتەکەیداو خەڵکی دەچەوسێنێتەوە.

*ئەگەر کەوانەکەی تەنیاکەوتو تاڵەکەی قورسبوو خۆشی لەسەفەردابوو سەفەرەکەی ماندویدەکا، ئەگەر بازرگانبوو زەرەر دەکات، ئەگەر کوڕێکی هەبوو کوڕەکەی ناتەواودەبێ، ئەگەر ژنی هەبوو ژنێکی خراپە، ئەگەر کەوانەکە ئاسانبوو لێکدانەوەی پێچەوانەیە، ئەگەر تیرێکی لێوەهەڵداو نیشانەکەی پێکا دەگات بەویستو خوازی خۆی، ئەگەر پیاوێکی خواناسبوو فەرمان بەچاکەدەکات.

**کەوتن:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی کەوتوەتە نێو ئاوێکی زۆری قوڵەوە بەڵام نەگەیوەتە بنەکەی دنیایەکی بەرین بەدەستدەهێنێ چونکە دنیا

دەریایەکی قووڵە، یاخود دەڵێن: دەکەوێتە کارێکی گەورەوە.

*ئەگەر بینی کەوتە نێو ئاوەوە خۆشحاڵی و نازو نیعمەت بەدەستدەهێنێ.

**کەوتن بەزەویدا:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیەلەسەر ناخۆشی سەفەر.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا سەرگەردانییە ، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ وَمَن جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ ﴾ (النمل: ٩٠).

**کەوتنەخوارەوە( بەربوونەوە ):** (نابلسی)دەڵێت: لەسەرەوە بۆ خوارەوە بەڵگەیە لەسەر گۆڕینی حاڵوبار لەخێرەوە بۆ شەڕ ،یان لەهاوسەرێکەوە بۆیەکێکیتر یا لەپیشەیەکەوە بۆ یەکێکیتر یان لەمەزهەبێکەوە بۆ مەزهەبێکیتر، بەڵگەشە لەسەر دەرەنجامی باش، ئەگەر ئەوەی بۆی دابەزی سەوزبوو یان خواردنێکی باشبوو بەڵگەیە لەسەر گوزەران و حاڵباشی.

*ئەگەر دابەزی بۆ ئاژەڵێکی درندەو وێرانەیەك بەڵگەیە لەسەر رەزیلی و حەسوودی لەماڵ و سامانیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّى ﴾(الليل:١١).

*ئەگەر بینی کەوتەخوارەوە لەسەربانی ماڵێك و دەستو قاچی شکا بەلاو نەهامەتی رووی تێدەکات یان روو لەماڵ و هاوڕێی دەکات یاخود لەلایەن فەرمانڕەواوە خراپەی پێدەگات.

**کەوسەر:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەئاوی کەوسەر دەخواتەوە لەبەهەشتدایە زانیاری و کرداروو دڵنیایی و شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەدەستدەهێنێ، ئەگەر بێباوەڕبوو موسوڵماندەبێ، ئەگەر سەرپێچیکاربوو تەوبەدەکات یان لەبیدعەوە دەچی بۆ سوننەت یان لەژنێکی خراپەوە بۆ ژنێکی چاك و باش.

*ئەگەر بینی لەئاوی (کەوسەر) دەخوات و پلەوپایە بەدەستدەهێنێ لەگەڵ سەرکەوتن بەسەر دوژمنانیدا بەپێی ئایەتی: ﴿ انا اعطيناك الكوثر﴾ (الكوثر : ١).

**کەوشدروو:** (نابلسی) دەڵێت: کەوش دروویی چەن جۆرێکە یەکێکیان کەوش دروویی سۆلی ژنانە، بینینی بەڵگەو نیشانەیە لەسەر مارەبڕ یان رێکخەری مابەینی ژن و پیاو.

*کـــەوش درووی پیـــاوان بەڵگـــەو نیشانەیە لەسـەر خزمـەتکارو سـەفەرو گەشت.
*بینینی بەڵگەو نیشانەیە لەسەر رزق و ڕۆزی و هەوڵدان بۆ بژێوی پەیداکردن و خستنەرووی وەچـەو منـاڵ و دانـانی شتێك لەشوێنی خۆیدا.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسـەر ئەوەی خێروچاکە لەسەر دەستی ئەودا روودەدات و بەدەســـتدێت لـــەئاین و دنیادا.
(ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: کـەوش رووی نادیـار پیاوێکـە میراتـی دابەشـدەکات و دادپـەروەرە تێیـدا پێـست و چـەرمیش بەهـەمان شـێوازەو سـەرجەم پێستەی ئاژەڵ میراتە.
**کەوگیر:** (ئیبن سیرین)دەڵێـت: کـەوگیر جێگەی متمانەیەو لەسەردەستی بژێوی خانەوادەکەی بەدەستدەێت.
(نابلـسی)دەلێـت: ژنێکـی بەناوبانگـەو پارەوپوول لەسەردەستی پەیدادەبێت.
**کەوڵفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بینینـی ئەگـەر لـەوەرزی هاوینـدابوو بەڵگەیـــە لەســـەر غـــەم و پـــەژارەو نەخۆشی، لەزستانیشدا بەڵگەیە لەسەر لەشـــساغی و چوســـت و چـــالاکی و بەتاڵکردنەوەی غەم و پەژارە.
**کـەوڵکار:** (نابلـسی)دەڵێـت: لەخـەودا پیاوێکە ماڵ وسامانێکی زۆری هەیە .
**کـەوەر:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: رزق و ڕۆزییـــە لـــەپیاوێکی کـــەم ئەقڵـــەوە، هـــەروەها ئـــەوەی بیخـــوات مـــاڵی حەرامدەخوات بەهۆی پیاهەڵدانی درۆو دزییـەوە، ئەگـەر بـەلێنراوی خـواردی تەویە دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ مـاڵێکی حەرام.
*ئەگـەر کـەوەری هـەڵگرت وتەیـەك دەڵێت پاشگەز دەبێتەوە لێی.

## ك ی

**کیژۆڵـە:** (نابلـسی) دەڵێـت: بینینـی کیژۆڵەیـەکی بچووك لەخـەودا بەڵگەیـە لەسەر فەرپییت و شکۆمەندی و ئاسـانی دوای قورسی و گرانی.
*ئەگـەر منـداڵێکی بـچووکی دۆزییـەوە یـان هـەڵیگرت یـاخود بـووی ئەگـەر زینـــدانیبوو یـــاخود لەبەربرەکانیـــدا دەســـتدرێژکاربوو یـا قـەرزاربوو یـان دەرووی لێکرابـوەوە غـەم و پـەژارەی بەمـژدە دەڕەوێتـەوە، ئەگـەر هیچکام لەوانـە نـەبوو ئـەوجا کیژۆڵەکـە غـەم و پەژارە دەبێ بۆ یەکێك بیبینێ ، ئەگـەر نەخۆشـــێك بیبینێـــت دەوریـــان

لێدەكرێتەوە مەگەر لەدەمیەوە بێتەدەرەوە ئەوجا بەڵگەیە لەسەر مردن.

*كیژۆڵە دنیایە بۆیەكێك بیبینێ.

*ئەگەر ژنێك بینی كیژێكی دەبێت پیشەیەك رووی تێدەكات.

*ئەگەر ژنێكی دووگیان بینی بوە بەكیژۆڵەو بچووك بوەتەوە ئەوجا ئەگەر دووگیانبوو كیژێكی وەك خۆیدەبێ.

*بینی كوڕێكی كڕی غەمو پەژارە رووی تێدەكات.

*ئەگەر كیژۆڵەیەكی كڕی ئەوجا خێر رووی تێدەكات.

*ئەگەر بینی كوڕێكیبوەو ژنەكەشی دووگیانبوو كیژێكی دەبێت، ئەوەی كیژێك بكڕێ خێری دەستگیردەبێت.

*ئەگەر بینی كیژێكیبوو كوڕیدەبێ.

*ئەگەر بینی كیژۆڵەیەكی بەدەستەوەگرتوە خێرە.

*ئەگەر بینی بوەتەوە بەمنداڵ ئەگەر ماڵو ساماندارییوو ئەقڵو ژیری لەدەستدەدات یان ماڵو سامانەكەی لێدەگیرێتەوە، ئەگەر هەژاربوو تەمەندرێژ دەبێ.

**كیسەڵ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: كیسەڵ ژنێكە خۆی جواندەكاو بۆنیخۆشیش لەخۆیدەداتو خۆیدەخاتە روو لای پیاوان.

*هەروەها دەڵێن: كیسەڵ دادوەری دادوەرانە چونكە شارەزاترین گیانداری نێودەریایە.

*ئەگەر كیسەڵێكی لەنێو خۆڵو زبڵداندا بینی خۆیشاردوەتەوە زانایەكی نەناسراو هەیە بەهۆی نەناسینی لەلایەن خەڵكی ئەو ناوچەیەوە.

*هەروەها دەڵێن: كیسەڵ پیاوێكی خواناسو قورئانخوێنەو خواردنی گۆشتەكەی ماڵ یاخود زانیارییە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر كیسەڵێكی بینی لەوڵاتو گوندێكدا رێزی لێگیرا زانایان لەوشوێنەدا بەرێزو شكۆمەندن.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی كیسەڵ بخوات خێرو چاكە یاخود سوودو قازانجی دەستگیردەبێت.

*ئەگەر بینی كیسەڵی بەدەستهێناوە یاخود بوە بەخاوەنی كیسەڵ یا دەیباتە نێومالّی خۆی مرۆڤێك بەدەستدەهێنێت زانستی دێرینی هەیە.

*ئەگەر لەرێگەی خۆیدا كیسەڵێكی بینی فڕێدرابوو هیچ گرنگیەكیان پێنەدا

زانایەکی فەرامۆشکراو هەیە کەس گرنگی پێنادات.

*ئەگەر بینی لەدەفرێکدا پارێزراوە یان لەجلو بەرگێکدا زانا لەوشوێنە بەرێزو بەرزە.

*هەروەهادەڵێن: بینینی کیسەڵ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر فرۆفێڵو جاسوسیو خۆشاردنەوەو شەڕو دارایی چەكو جبەخانە.

**کینتار**[1]: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا دەوڵەمەندییە بۆ هەژار، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ وَالقَنَاطِيرُ المُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَهَب والفِضَّةِ ﴾ (آل عمران ١٤).

## ك ی

**کێچ**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: کێچ سەربازی پەروەردگارەو بەو سەربازانە (نەمرود)ی تیابرد.

*پیاوێکی نەفس سووكو نزمە، ئەوی ببینی کێچ گازی لێدەگرێ ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت.

(نابلسی) دەڵێت: ئەوەی ببینێ کێچ دەیگەزێت غەمو پەژارە رووی تێدەکاتو هەرەشەی لێدەکرێت. کێچ دوژمنی لاوازەو خوێنی کێچ بەڵگەیە لەسەر ماڵ لەلایەن خەڵکی پەستو دڵگرانەوە.

**کێرد (قیمەکێش)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: خاوەن دەستەڵاتە ، ئەگەر لەسەر دارگوێزیوو دەستەڵاتی بەسەر عەجەمیە رژدەکاندا دەبێت.

(نابلسی)دڵێت: ئەگەر تەماشای شووشەیکرد کاروباری ژنانی پێدەسپێرێ.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: کێرد پیاوێکی بەهێزی ئازاو بڕەڕە لەبەربەرەکانیو کێشەدا.

(نابلسی)دەڵێت: کێرد جیاکەرەوەیە لەنێوان کاروباری قورسو گراندا، ئەوەی بجەنگێت لەگەڵی لەوڵاتدا بڵاویدەکاتەوە.

**کێشان بەدەمو چاودا**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کوڕ دوای ناهومێدبوون لێی بەپێی ئایەتی: ﴿ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا ﴾ (الذاريات: ٢٩).

**کێشانە**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پابەند دەبن پێوەی یاخود بەهۆی ئەوەوە رێنومایی دەکرێن لەدادوەرو زاناو دەستەڵاتدارو قورئان ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زوبانی خاوەنەکەی.

---

[1] **کینتار**: ٩٢٨ر٤٤ کیلۆگرامە.
(فەرهەنگی دەریا:ج٢/١٠٠٠).

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر کێشراوو هەردووکیشیان بەڵگەیە لەسەر باوەڕو دادپەروەری لەگوتەو کرداردا.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+هاوسەر.
+قەرزدانەوەو بەسەربردنی نەزر.
***کێشانەی ئاش***: بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی ڕێزدار لەخودی خۆیداو سووکو ناقۆلا لەهیمەتو کارو کاسبیو دەستەواژەو جموجووڵیدا.
***کێشانەی ئێسقان***: بەڵگەیە لەسەر کوڕێکی لاڵو ناتەواو.
***کێشانەی میسك (بۆنیخۆش):*** ئاگادارییە لەبێئاگاییو سووربوونە لەسەر لێپرسینەوەی خود لەسەر نەزر.
*کێشانە بەدادوەر لێکدەدرێتەوە ئەگەر تازەبوو ئەو دادوەری لەشاردا بەزاناو بەهێزو توانایە.
*تای تەرازوەکان دادوەرانە بەهۆیانەوە دادگایە یەکلایی دەکرێتەوە.
*ئەگەر کێشانەیەکی بینی لەئاسمانەوە دابەزی خوازیارو داواخوازی حەقە.
*تای تەرازوو زانیاری دادوەرە، ئەگەر بەرینو گوشادو ڕێکبوو دادوەر شارەزاییەکی تەواوی هەیە، خۆئەگەر ناتەواوبوو دادوەر ناتوانێ بڕیار بدات.
*ئاسنی کێشانە دەروونی دادوەرەو بزماریش دەستەلاتەکەیتی، زنجیرو پەتەکەی هاوکارو جێگیرەکانیەتیو ئەڵقەکەی ئەوکەسەیە کەمتمانەی پێدەکات.
*ئەگەر هەردوو تای تەرازوەکە قورسبوو دادوەر بەرتیل وەردگرێ، ئەگەر قورسی کەوت بەلای ڕاستدا دادوەر لادەدا بەلای شکاتکاردا، خۆئەگەر بەلای چەپدا کەوت لادەدات بەلای سکاڵاو شکایەت لێکراودا.
*ئەگەربینی (فلس)دەکێشێ گوێبیستی شەهادەتی درۆدەبێتو بڕیاری پێدەدات.
*ئەگەربینی خوداوەند لێیدەپرسێتەوەو کردارەکانی لەکێشانەیا دانراوەو چاکەکانی قورستربوو لەکاروبارەکانی دنیادا لەخۆی دەپرسێتەوەو لای خوداوەند ئەجرو پاداشتێکی گەورەو مەزنی هەیە.
*کێشانەی قیامەت بەڵگەیەلەسەر:
+دەرکەوتنی نهێنی.
+چەسپاندنی بەڵگە.
+خۆشیو شادی.

+سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا.
+دادپەروەری.
*ئەگەر خەوبینەر بینی دادگایدەکراو کێشانەی کردارەکانی قورسبوون قوتارو سەرفرازدەبێت، ئەگەر کێشانەی چاکەکانی سوکببوو زەرەردەکات.
*هەموو کێشانەیەك بەڵگەیە لەسەرئەوەی پابەند دەبێت پێوەی‌و ڕێنومایدەکرێ بەهۆیەوە وەك زاناو دەستەڵاتدارو قورئان.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زوبانی هاوەڵەکەی.
*ئەگەر هاوسەنگی تێدابینی لەراستگۆیی‌و درۆو ناپاکیدا دەگەڕێتەوە بۆلای .
*کێشانەی وشکە فرۆشەکان گەنجینەداری ماڵە.
**کێشانەباز( کێشانەکار ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت:کێشانەساز بەڵگەیە لەسەر فەرمانڕەوایەکی دادپەوەر ئەگەر ناپاکی نەکات لەکێشانەدا.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی کێشانەیەکی ڕێك ئەنجامدەداتو لێدەبێتەوە لەبڕیاردانددا دادپەوەرو بەویژدان دەبێ لەگەڵ ژێر دەستەکانی.

*کێشانەساز ئەگەر بۆ دادگا بەکەڵکبوو بەدەستیدەهێنێ یاخود بۆ فەرمانڕەوای، خۆئەگەر شایستەی نەبوو لەسەرجەم کارەکانیدا باشدەبێ‌و لەوتەشدا راستگۆو مامەڵەی باشدەکات، دوای حەقدەکەوێ.
(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دادپەروەری‌و راستگۆیی لەوتەداو بینینی بەڵگەیە لەسەر زانیاری‌و بابەتی بەسوود.
**کێشانەو پێوانە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ڕێنومایی‌و زانیاری‌و هاوسەرو ڕزق‌و رۆزی‌و غەم‌و پەژارەو هەژارییە بەپێی چیرۆکی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت) لەگەڵ براکانی.
**کێشی ماڵ‌و سامان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئیشی ماڵ‌و سامان لەنێوان هەردووکڕیارو فرۆشیاردا غەرامەیە.
**کێك:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا سەفەرەو بردنی بۆیەکێك کەنەتوانێ بیخوات بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارەو ناڕەحەتی. ئەوەی لەخێر یا شەڕدابێ‌و لێی دابڕابێ پاشان دەگەڕێتەوە سەری چونکە سەرەتای وەك کۆتایی وایە.
**کێك دروستکەر:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سەفەرو جەمکردنەوەی ماڵ لەشەڕو بەربەرەکانیدا.

**كـيلاَن:** (نابلـسى)دەلێـت: كـێلانو جووتكردن لەخـەودا هاوسـەرگیریو ژن هێنانە.

*ئەگـەربینی لـەزەویی كەسـێكیتردا جووتــدەكات خاوەنەكــەی بناسـێت ژنەكەی ئەو دەهێنێت.

**كێڵگە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: كشتوكاڵ بەڵگەیە لەسەر ژن ، چونكە دەكێڵـیو تــۆوی پێـــوەدەكریو ئـــاودەدریو بەروبووم دەگریّ.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر بـازاڕو كەلاكـــەنو قـــەدەكانی روەك رزقو رۆزیو سوودو قازانج بێت بەهۆی زۆری سوودو قازانجو زیانی كشتوكاڵەوە.

*هەروەها بەڵگەیەلەسەر:

+گۆرەپانی جەنگ.

+دنیـــاو كۆمەڵەخـــەڵكێك گـــەورەو بچووكیانو پیرو لاو یان چونكە لەزەوی دروستكراون لەویش پێگەیـشتوون وەك كـــشتوكاڵ، خوداوەنـــد دەفـــەرموێ: ﴿والله أنبَـــتَكُمْ مِـــنَ الأرْضِ نَبَاتاً﴾(نوح:١٧).

*هەروەها دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ساڵانی دنیا لەگەڵ مـانگو رۆژەكـانی . حــەزرەتی (یوســف) (ســەلامی خــوای لێبێت) بەساڵان لێكیداوەتەوە.

*دەگونجێـــت بەڵگــەبێت لەســـەر ماڵوســـــامان لــــەدنیا لەگــــەڵ گەنجینەكانی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شوێنو جێگەیــەك كــشتوكاڵی بــۆ قیامــەت تێـدابكریّ وەك مزگـەوتو خەڵوەتگـەو كـۆڕی زیكـرو خێـرو بـەپێی ئایـەتی: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا﴾(الـشورى:٢٠)ئـەوەی لەدنیادا كێڵگەیەك بكێڵێ ژنەكەی مـارە دەبـــڕێ، ئەگـــەر كـــشتوكاڵەكەی روا ژنەكەی دووگیاندەبێ، ئەگەر رەبەنبوو هاوســـەر دەگـــرێ، وەگـــەرنا بـــازاڕی گـــەرموگوڕ دەبـــێو ســـوودو قـــازانجی زۆردەكات، دەگونجێت بەقـەرز بیـداتو بڵاویبكاتـــەوە، وەگـــەرنا لەكوشـــتارو جەنگاندندا بەگەڕیدەخات.

**كێم( زوخم ):** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵو سـامانێكە نـەشونمادەكات بـەڵام هــەموو مانگێــك لەلایــەن هاوەڵێكــەوە پارەی لێدەبڕیّ.

*ئەگەر بینی كـێمو زوخـم لەجەسـتەی دەرهات بەهۆی برین یـان هەرشـتێكیتر توهمەتباردەكریّ بەتاوانێك.

*كــێمو زوخـــمو ئـــەوەی لەعـــەورەت دێتەدەرەوە ماڵو سامانی حەرامە.

*هـــەروەها كـــێمو زوخمـــی دوومـــەڵ بەڵگەیە لەسەر دەرووی خێر.

# گاف



## گا

**گا**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: گا لەبنەڕەتدا هۆکارێکی سوودمەندیی و هێزە بۆ دەستەڵاتدارو ماڵ و دارایی و چاکە مەگەر شاخداربێت پیاوێکی رسواو ملکەچی هەژارەو رزق و رۆزی تەنگە.

*دەگونجێت گا بەردەست و خزمەتکاربێت چونکە لەکرێکارانی سەرزەوییە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرداریی بەهۆی کێڵانەوە، یاخود لەوانەیە بەڵگەبێت لەسەر پیاوی گوندنشین و گاسن، یان دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پیاوی تووڕەو هەڵچوو.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر یارمەتی و خزمەتکارو هاوەڵ چونکە هاوکاریی و خزمەتی گوندنشینان دەکات، ئەوەی لەخەودا گایەکی هەبێت ئەگەر ژنبێت مێردەکەی گوێڕایەڵ و ملکەچیدەبێت، خۆئەگەر ژنێك بێمێردبێت هاوسەر دەگرێت یان ئەگەر خاوەن دوو کچ بێت دەیاندات بەشوو.

*ئەگەر دەستەڵاتداربێت دەستکەوت و خوازی بۆ دێتەدی، ئەگەر سواربێت بەهێزترە.

*ئەگەر گایەك سەربڕێت و دەستەڵاتداربێت خزمەتکارو بەردەستی خۆی دەکوژێت یان هەڵدەچێت بەسەریا، ئەگەر خەڵکێکی ئاسایی بێت زاڵدەبێت بەسەر ئەوەدا کەلێدەترسێت مرۆڤێك بەکوشتدەدات و بەگەواهیەك کەلەدژی دەیدات.

*ئەگەر لەدواوە سەربڕی یاخود لەورگییەوە یان لەشوێنێکیترەوە ستەم لەپیاوێکدەکات و هەڵدەکوتێتەسەری و ماڵ و دارایی دەبات و بەبێئاگاداری ئافرەتێکی خانەوادەکەی مارەیدەبڕێت مەگەر نیازی لەسەربڕینی خواردنی گۆشتەکەی و خۆشەکردنی پێستەکەی

بێت، ئەگەر فەرمانڕەوابوو هانی دەوروبەرەکەی دەدات لەسەر خەڵکیترو ماڵەکەی بەتاڵانکردن دەدات، ئەگەر بازرگانبوو دەرگای گەنجینەکانی دەخاتە سەرپشت بۆ فرۆشتن یان سوودو قازانجکردن، ئەگەر گاکە قەڵەوبوو سوودیی لێوەردەگرێت ئەگەر لەڕولاوازبوو زەرەی لێدەکات.

ئەگەربینی سواری گایەك دەبێت خێری دەستگیردەبێت بەمەرجێك گاکە سوورنەبێت، ئەگەر گاکە سووربوو کوڕەکەی تووشی دەبێت وگاکە دەبێت بەگورك و بەلگەیە لەسەرئەوەی فەرمانڕەوایەکی دادپەروەرەو دواتر دەبێت بەستەمکار...

*یەك گا بۆ فەرمانڕەوا فەرمانڕەوایی ساڵێکەو بۆ بازرگانیش بازرگانییە بۆ ماوەی ساڵێك.

*ئەگەر ببێت بەخاوەنی کۆمەڵێ گا کۆمەڵە فەرمانڕەواو سەرکردەیەك گوێڕایەڵی دەبن.

*ئەگەر سەری گایەك بخوات پلەوپایەو ماڵ‌ودارایی‌و خۆشحاڵی بەدەستدەهێنێت بەمەرجێك گاکە سوورنەبێت.

*ئەگەر بینی گایەکی کڕی دڵی کەسانی ڕێزدارو براو دۆستەکانی رادەگرێ بەقسەو لێدوانی شیرین.

*ئەگەر گایەکی سپی ببینێ خێروچاکەی دەستگیردەبێت، ئەگەر شاخی پێداکرد خوداوەند لێی زویر دەبێت، هەروەها دەڵێت: ئەگەر گاکە شۆقی لێدا خوداوەند منداڵی چاك‌و باشی پێدەدات.

*ئەگەربینی گاکە هاشاوڵی بۆمێناو پەلاماریدا سەفەرێکی دووردەکات.

*ئەگەر دوا لەگەڵ گاکەدا یان گاکە لەگەڵی دوا لەنێوان خۆی‌و پیاوێکیتردا شەڕو ئاژاوە دەکەوێتەوە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر گایەك بکەوێت بەسەریا دەمرێت هەروەها سەربڕینی گاش هەروایە، بەڵام ئەوەی گایەك گازی لێبگرێ بەڵاو نەهامەتییەك رووی تێدەکات.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم گایەکی گەورەو مەزن لەکونێکی بچووك هاتە دەرەوە، ئێمەش پێی سەرسامبووین، ئنجا هەر ئەوگایە ویستی بگەڕێتەوە ئەو کونە بەڵام نەیتوانی‌و ئاستەنگ‌و قورسبوو بۆی.

(ئیبن سیرین) لەلێکدانەوەیدا بۆ ئەو خەوە وتی: وشەیەکی مەزنە کاتێ لەزاری دێتە دەرەوە ناتوانێ بیگەڕێنێتەوە.

*هەروەها لە(ئیبن سیرین)ەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: کۆمەڵە گایەك عەجەمە، ئەگەر لەچواردە گا زیاتربوو جەنگە، ئەگەر کەمتربوو گێرمەو کێشمەو تەنگو چەڵەمەیە، ئەوەی گایەك شۆقی لێبدات لەپلەوپایەو دەستەلاتی لایدەبات، ئەگەر فەرمانڕەوابێت لەکار دەخرێت، کرێکاریش بێت لەکاروپیشەکەی دووردەخرێتەوە.

*پێستی گا فەرپیتو بەرەکەتە.

(نابلسی)دەڵێت: گا لەخەودا سەرۆكو گەورەی کۆمەڵێکە یان گەورەی ماڵو شارو گوندە ، یەك گا فەرمانڕەواییە بۆ یەك ساڵو بۆ دەستەلاتدارو پیشەوەر بازرگانییە بۆ ماوەی یەك ساڵ.

*ئەگەربینی بوە بەخاوەنی چەند گایەك دەستەلاتێك بەدەستدەهێنێت گەرشایستەبێتو چەند سەرکردەیەك لەژێر دەستیدا دەبنو لەکاریان دەکات بەئەندازەی گوێڕایەڵی. ئەگەر بازرگانبوو شەریكو هاوبەشەکانی دەچنە ژێردەستی، ئەگەر کەسێکی بازاریشبوو کرێگرتەو کریکارەکانیەتی.

*گا کرێکارە ئەوەی ببینێ سوارییبوە کرێکارێکی تووڕەکردوە، ئەگەر گاکە باری هەڵگرتبوو، کرێکارەکەی ماڵودارایی بۆ بەدەستدەهێنێت بەئەندازەی بارەکەو جۆرەکەی ، ئەگەر بردیە نێوماڵی خۆیو خۆشی سواربوبوو خێری پێدەگات.

*گا مولكو دوژمنە، شۆقی رنقو رۆزی حەلاڵە.

*ئەگەر بینی گایەکی کڕیوە دڵنەوایو نەوازشی هاوڕێکانی دەکات بەقسەی شیرینو نەرمو نیان.

*گا پیاوێکی گەورەی پارێزراوە، گۆشتەکەی ماڵێکە لەلای ئەو پیاوە گەورەیەوە دێتو چەوریەکەشی رنقو رۆزییە لەساڵەکەیدا.

*ئەگەربینی گۆشتی گا دەخوات دەوڵەمەنددەبێت.

*ئەگەر سوارییبوو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوە.

*ئەگەر گاکە سوارییبوو یان بریندارییکرد لەوساڵەدا دەمرێت.

*ئەگەر گایەك لەقەفەسێکدا بینیو خۆی نەخۆشو دیلبێت ئازاددەکرێت.

*ئەگەر بینی گایەك زەوی دەکێڵێتو جووتیاربوو فەڕو خێردەکەوێتە کشتوکاڵو بەروبوومەکەیەوە، ئەگەر بازرگانبوو زەرەروزیان روو لەبازرگانیەکەیدەکات، ئەگەر زانابوو پتر چاكو باشدەبێت.

*ئەگەر بینی گایەك دەیدات بەزەویدا نزیكدەبێتەوە لەتیاچوون یان دەمرێت لەو نەخۆشیو بەلآیەی رووی تێدەكات.
*گا بەڵگەیە لەسەر:
+ناڕەحەتی قورسو گران.
+دەركردنو دوورخستنەوە.
*بۆیەكێك بەدەریادا سەفەر بكات ناڕەحەتیو بەلآ رووی تێدەكات.
*ئەگەر رەوگە گایەك بەدیبكات ناڕەحەتی رووی تێدەكات، ئەگەر سواری گایەكبوو ناوبانگو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوە، ئەگەر گایەك دوالەگەڵی یان خۆی دوا لەگەڵی ئاژاوەو دەنگدابڕان دەكەوێتە نێوان خەوبینەرو پیاوێكی ترەوە.
*ئەگەر بینی گایەكی گەورە لەكونێكی بچووك دێتە دەرەوە پاشان كاتێ ویستی بچێتەوە شوێنی خۆی نەیتوانی وشەیەكی مەزنیكردووەو ناتوانێت بیگەڕێنێتەوە.
*ئەگەربینی سواری گایەكی رەشبوە یاخود گاكە گازی لێدەگرێتو هەڕەشەی لێدەكاتو دەیەوێت زیانی پێبگەیەنێت بەنێو دەریادا تێدەپەڕێتو ناڕەحەتیو بەلآ دێتەرێیو لەلێواری نوقمبوون نزیكدەبێتەوە بەلآم دواتر قوتار دەبێت.
*ئەگەر ببینێت رەوگە گایەك دێنە نێوشار دزو جەردەو ستەمكار روودەكەنە ئەوشارە.
*ئەگەر بینی گایەك بەكێشیدەكات لەشوێنی خۆی لایدەدات ئەگەر فەرمانڕەوابوو لەكاردەخرێت.
*هەروەها دەڵێن: گا بەڵگەیە لەسەر پیاوێكی ستەمكار ئەگەر كوژرا یان سەربڕا ستەمكارە هەڵچوەو تیادەچێت.
*ئەگەرببینێ سواری گایەكبوە لەلایەن فەرمانڕەوایەكەوە كارێكی دەستگیردەبێتو خێری لێدەبینێت.
*ئەگەربینی سواری گایەكی رەشبوە ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت، ئەگەر گاكەی كردبەماڵی خۆیدا لەوساڵەدا ماڵودارایی بەدەستدەهێنێت، ئەگەر گاكە خاوەنی چەن شاخێكبوو ساڵە بەپێی زیادوكەم، ئەوگایەی بێ شاخە پیاوێكی رسوای هەژارەو وەك مەڕ وایە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پیاوێكی گوندنشین یان كاسن.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەڵچوون چونكە زەوی دەكوتێتەوەو هەڵیدەداتەوە لەسەرەوە بۆ خوارەوە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوكارو هاودەمو هاوڕێو برا.

*ئەگەر ببێت بەخاوەنی گایەك گەر ژن بێت مێردەکەی ملکەچیدەبێت، ئەگەر بێشووبێت شوودەکات، کچیشی هەبێت کچەکەی دەدات بەشوو.
*ئەگەر سواری گایەکی سوور یان زەرد ببێت بێنەوەی ئامرازی سواربوونی لەسەر پشتبێت نەخۆشدەکەوێت.
*دەگونجێت گا بەلگەبێت لەسەر لاوێکی جوانو قەشەنگ.
*بینینی گا بەلگەیە لەسەر روودانو خۆشکردنی فیتنەو ئاژاوە یان کۆمەكو یارمەتی.
*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر سەرسوڕمان.
*<u>**گای بەڵەك بەڵەك**</u>: بەلگەیە لەسەر خۆشیو شادی.
*<u>**گای رەش**</u>: دەستکەوتو چارەسەرە بۆ نەخۆش.
**گازگرتن**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: گازگرتن فرۆفێڵە. هەروەها دەڵێن: گازگرتن بەلگەیە لەسەر رۆچوون لەخۆشەویستی گەزراودا گەر مرۆڤ بێت یان هەرشتێکیتر.
*ئەگەر مرۆڤێك گەزراو خوێنی لێدەرهات خۆشەویستی لەگوناهو تاواندەبێ، ئەگەر گازیگرت لەپەنجەکانی غەمو پەژارە بەمەترسیداربوونی ئاینەکەی رووی تێدەکات.

(نابلسی) دەڵێت: گازگرتن بەلگەیە لەسەر کۆڕستان، ئەگەر گازی لەگۆشتی خۆیگرتو فڕێی دایەسەرزەوی کەسێکی فێڵبازە.
*ئەگەر مرۆڤێکی بینی گاز لەپەنجەکانی دەگرێ خەشمو قینی هەیە بەرانبەری بەپێی ئایەتی: ﴿عَضُّوا عَلَيْكُمُ الأَنَامِلَ مِنَ الغَيْظِ﴾ (آل عمران: ١١٩).
*ئەگەر بینی گاز لەپەنجەکانی دەگرێ پەشیمانی بەپیاوێکی ستەمکار بەپێی ئایتی: ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ﴾ (الفرقان: ٢٧).
*گازگرتن ئەگەر خوێنی لێهات قەیرانو گوناهبارییە.
*گاز رۆچوونە لەخەشمو قیندا، ئەگەر مرۆڤێکی بینی گازی لێگرت خۆشحاڵیو شادی رووی تێدەکات لەسەرەتای تەمەنیەوە بەلام تووشی دڵتێشەدەبێت.
**گازۆلك( قالۆنچە )**: دوژمنێکی رەزاگرانی پیسو گەندەڵە، نێرەکەی بەلگەیە لەسەر خزمەتکاری دڕندەو خراپەکاران ، مێیەش بەلگەیە لەسەر مەرگی ژنی زەیستان.
*گازۆلك ژنێکی شپرزو بێخێرە.

*ئەگەر بینی گازۆلك بەدەستدەهێنێت دەچێتە لای ژنێكی هاوچەشنی ئەوە.
*ئەگەر بینی گازۆلك خەریكە دەبێت بەدووپشك دوژمنێكە گومانێكی واژووی پێدەبات.
**گاڵتە**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: فروفێڵو گزییە، ئەگەر بینی گاڵتەیان پێكرد گزیو فێڵی لێدەكەن.
**گاڵتە پێكردن(سووكایەتی)**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا وەك ئەوەی گاڵتە بەباوەڕدارێك دەكات ناهومێد دەبێت لەپیاوێك كەئومێدی پێی هەبووەو بەڕسوایی‌و ملكەچی پێشوازی لێدەكات.
*ئەگەر بینی یەكێكیتر گاڵتە دەكاتو لاویكی نادیاربوو زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەكەیدا، ئەگەر ریش سپییەكی نادیار گاڵتەی پێكرد هەژار دەكەوێت چونكە باپیرەیەتی.
(نابلسی)دەڵێت: گاڵتەو سووكایەتی لەخەودا بەڵگەیەكی خراپە، ئەگەر كەسێك بینی كارو رەفتاری گاڵتەكاران دەكرێت بەرانبەری هەمان حاڵی ئەوان دێت بەسەریا ئەگەر لەپلەوپایەداران بێت.
**گامێش**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: گامێش وەك گاوایە، پیاوێكی پارێزراوە، گامێشی مێینە وەك مانگا وایە لەلێكدانەوەدا. هەروەها شیرو گۆشتو پێستو ئەندامەكانیشی پیاوێكی ئازایە لەكەس ناترسێت، ئێشو ئازاری خەڵكی لەسەرو توانای خۆیەوە هەڵدەگرێتو سوودیان پێدەگەیەنێت.
*ئەگەر ژنێك بینی شاخی هەیە وەك گامێش دەستەڵات بەدەستدەهێنێت یاخود فەرمانڕەوایەك دەیكات بەهاوسەری خۆی ئەگەر شایستەبێت، ئەو لێكدانەوەیە دەگونجێت بۆ بژێوی پەیداكاری بێت.
(نابلسی)دەڵێت: گامێش سەرۆكێكی بیدەعەچی‌و داهێنەرەو بەهێزو هەیبەتە، گامێش لەخەودا پیاوێكی بەهەیبەتی گوێ هەڵخەرە بۆ قسەو زۆرسەفەر دەكات بەوشكانی‌و دەریاداو داواكاری داوایەكەو تێدا دوژمن زاڵدەبێت بەسەریا.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماندووبوون‌و دەستكورتی وێڕای خێرۆمەندی‌و خێرخوازیی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خراپەكاری ئەگەر لەكشتوكاڵدا بەكارهات بەڵگەیە لەسەر هەژاری‌و پێویستی.

*ئەگەربینی بوە بەخاوەنی کۆمەڵێك گامێش دەبێت بەبەرپرسی پیاوانی گەورەو لەشولارگەورە.
*ئەگەربینی سواری گامێش بوە یان رەنجو هەوڵیدا یاخود چوەنێو ماڵەکەیو کارێکی هێنا بەسەریا وەك گا وایە لەلێکدانەوەدا.
*گامێشی مێینەش وەك مانگا وایە لەسەرجەم حاڵەکانیدا.
**گاوان:** سەبارەت بەخاوەنی رەشەوڵاخ (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا رزق و رۆزیو بەرێوەبردنی کشتوکاڵو بەروبوومە، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر سەرماو خول خواردن.

## گ ر

*گرد(تەپۆڵکە): (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر زەوی بەڵگەبێت لەسەر خەڵکی، چونکە لەخاكو خۆڵ دروستکراون ، هەموو گردوو تەپۆڵکەیەکیش رێزو شکۆمەندییە بۆ یەکێك ناوبانگ دەربکات بەسەر خەڵکیدا بەهۆی رەچەڵەکەوە یان ماڵو دەستەڵاتەوە.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر شوێنی پیرۆزو پلەوپایەی بەرزو داهاتووی باش.
*ئەگەر خۆی بینیەوە لەسەر گردو تەپۆڵکەیەك و نەخۆشبوو ئەو گردو تەپۆڵکەیە دارەمەیتەکەیەتی، بەتایبەت ئەگەر خەڵکی لەژێریابوون، ئەگەر نەخۆش نەبوو خوازیاری هاوسەرگیریبوو هاوسەرگیری دەبەستێ لەگەڵ ژنێکی بەرێزو شکۆمەندو ناودار، لەدنیادا بەئەندازەی ئەو تەپۆڵکەیە توانای دارایی دەبێت.
*ئەگەر بینی لەسەر ئەو گردو تەپۆڵکەیە وتاردەدات بۆ خەڵکی یان بانگدەدات ئەگەر شایستەی دەستەلاتو فەرمانرەواییبوو بەدەستیدەهێنێتو ئەگەر گونجاو لەباریشبوو بۆ دادوەریىو فتواو وتار یان ناوبانگو روپامایی بەدەستیدەهێنێت.
*ئەگەر بینی زەوییەکی رێكو تەختو گردو تەپۆڵکەیەکی لەسەر هەڵتۆقیوە پیاوێکی دەستەلاتدارە بەئەندازەی ئەو گردو تەپۆلکە هەڵتۆقیوە، ئەگەر لەدەوروبەری خۆیدا سەوزایی بەدیکرد ئاینو مامەڵەی خۆشو سانایەتی.
*ئەگەر بینی لەسەر ئەو گردو تەپۆڵکەیە دانیشتوە یاخود خۆی وابەستەیکردو یان زاڵبوە بەسەریا وابەستەی پیاوێکی مەزنو گەورە دەبێت.

گیرفـان دڕانـدن بەڵگەیـە لەسـەر ئـەو حاڵوبارانـە، ئەگـەر گریـان لەترسـی خودابـوو یـان بـەهۆی کاریگـەربوون بەئایەتەکانی قورئـان یـاخود پەشیمان بوونـەوە لـەگوناهو تـاوانی رابـردوو بەڵگەیـە لەسـەر خۆشـیو شـادیو رەواندنەوەی خەمو پـەژارەو بەڵگەشـە لەسـەر بارانبـارین بۆئـەوەی بـارانی لێگیراوەو پێویستی پێیەتی.

**گـریۆوپێچ**: (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: گریۆوپێچ لەمێزەرو پەتدا سەفەرە.

**گرێـی شـتێك**: (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: گرێـی کـراس بەسـتنی گرێبەسـتی بازرگانییە.

*گرێـی پـەتێك باشـی ئاینـەو هـی دەستەسڕ بەدەستهێنانی خزمـەتکارەو هی شەرواڵ هاوسەرگیرییە.

*گرێـی دەزوویـەك بەسـتنی کارێکـە کەتێدایە لەدەسـتەلاتو هاوسـەرگیریو بازرگانی.

*ئەگـەر گرێـی بەسـت ئـەوە داواکـەی ئاساندەبێ، بەڵام ئەگـەر گرێینەبەست داواکـــەی قـــورسو ئەســـتەمو مەحاڵدەبێت.

*ئەگەر بینی گرێیەك لەشتێك درا بەبێ ئـەوەی توندی بکـات بەڵگەیـە لەسـەر غەمو پەژارە لەیـەن دەسـتەلاتدارەوە، ئەگەر بینی کەسێکیتر گرێکەی کردەوە ئەوکەسـەیتر هۆکـاری قوتـاربوون رزگاربوونیـەتی، ئەگـەر بینـی دوای مانـدوبوونو هـەوڵێکی زۆر کردیـەوە بەقورسـیو ئەسـتەم قوتـار دەبێـت، ئەگەر خۆی کرایەوە خوداوەند دەرووی خێری لێدەکاتەوە لەلایەکەوە هەستی پێنەکردووە.

(نابلسی) دەڵێـت: دەگونجێت گرێکـان پەیمانو بەڵێنبێت بۆ یەکێك.

## گ ڕ

**گرڕبڵێسە**: (نابلسی) دەڵێت: لەخـەودا قسەی ناقۆڵایـە ، ئەگـەر گڕوبڵێـسەی بینی قسەوگوتەیەکی خـراپ دەبیستێ لـەپیاوێکی دەسـتەلاتدارەوە، ئەگـەر بڵێسەی سەند ئەو قسەو گوتەیـە زیـاد دەکات.

*ئەگـە ئـەو گڕوبڵێـسەیە دوکـەڵی پەیداکرد ئەوکارە زۆرمەزنترە.

*گڕوبڵێـسە مەترسـییە لەهەرلایـەك لابـدات ئەگـەر گڕوبڵێسەکە سـووتاندی بەکزی دوژمنەکەی قسەی خراپدەکات بەرانبـەریو ئارامـدەگریٚ لەسـەریو دوژمنەکـــەی هێوردەکاتـــەوە، یەککگڕوبڵێسە وشەیەکی خراپە.

*ئەگـەر بینینـی گڕوبڵێـسە زۆربـوو لەسەری سزایەك دێت بەسەریا.

*ئەگـــەر بینـــی گروبلێـــسە لـــەنێو کۆمەلێکدا بلاوبوەوە دوژمنایەتیو رقو قینەدەکەوێتەوە لەنێوانیاندا.
*ئەگەر بینی گروبلێسە هەموو شتێکی سـووتاند قـسەو شـەڕو بەربـەرەکانیو جەنگـە لـەنێوان نەتەوەیەکـداو ستەمە بۆیان.
*هـەروەها گروبلێـسە بەلگەیـە لەسـەر کـوران ، ئەگـــەر ســـووتاندی یـــاخود کەوتەسـەر رووخـسار شـەڕو خراپـەی یەك لەدوای یەکە.
*دەگونجێـت گروبلێـسە بەلگـەبێت لەسەر بەدیو خراپی کردەوەکان.

## گ ژ

**گژنیژ:** (ئیبن سیرین) پیـاوێکی سـوود وەرگـرە لـەئاینو دنیـا، گژنیـژی وشـك مـــالو ســـامانێکە مـــالو دارایـــی بێچارەسەر دەکریّ.

**گژوگیای ئەسپەك:** (نابلـسی)دەلێـت: لەخـــەودا بەلگەیـــە لەســـەر خۆشـــیو شادیو نزیکبوونەوەی رزقو رۆزی.
*دەگونجێت بەلگەبێت لەسـەر هـەوالی خۆش یان مرۆڤی نامۆ بەهـەمان شـێوە ئەوەی لـەمیوەو گـولی بۆنـداری سـەیر دەچێت لەلێکدانەوەدا بەو شێوەیەیە.

## گ س

**گـسك:** (ئـیبن سـیرین)دەلێـت: گـسك خزمەتکارە .
(نابلسی)دەلێت : ئەگـەر زبـرو رەقبـوو خزمـەتکاری سەرپێـچیکارە ، گـسکی نەرمیش خزمەتکاری خزمەتکارەکانە.
*هەروەها گسك بەلگەیە لەسەر کچ.
*ئەگـەربینی مالەکـەی گـسك دەدات ئەگـــەر دەولەمەنـــدبوو ترســـی هەژارکەوتنی هەیە.
*هـــەروەها وتـــراوە: گـسکدانی مـــال بەلگەیـە لەسـەر مردنـی خۆشـی یـان چـوون روو بەکەسـێکیتر یـاخود مـالو سامانی پەرشو بلاودەبێتەوە.
*ئگـەر زەوییـەکی گـسکداو زبلـەکانی کۆکردەوە سـوود لەمالوسـامانی گونـد وەردەگـریّ ئەگـەر هـەیبێت، وەگـەرنا جـابیو هـــەژارێکی دەروودووکـــردوو دەبیّ.
*دەگونجێـت بینینـی گـسك بەلگـەبێت لەسـەر رەواندنـەوەی غـەمو پـەژارەو قەرزدانەوە.

**گـسکدان:** (نابلـسی) دەلێـت: بۆیـەکێك کاری پیسو پۆخلّ ئەنجامبدات بەلگەی خێرە بەتایبەت بۆ پیشەوەران.
*ئەگـەر مـالی کەسـێکی تـری گـسکدا مالو سامان بەدەستدەهێنیّ، گسکدان

بۆ دەوڵەمەند هەژاریی و کەمکردنی ماڵ و سامانە.

گ ل

**گلکار:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گڵکێش پیاوێکە ئابرووی خەڵکی دادەپۆشێ، ئەگەر بینی کارێك لەقوڕ دروستدەکات کردارێکی چاك و باش ئەنجامدەدات.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی گڵکار بەڵگەیە لەسەر توندوتیژی لەکاروباردا و ئەوەی خۆی لەبەرژەوەندیی و کاری کەسێکیتردا ماندودەکات.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر غەم و پەژارە.

**گڵ وقوڕکار:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر قوڕکاری بینی لەخەودا بەڵگەیەلەسەر غەم و پەژارەو گواستنەوەی قسەوباس، ئەگەر لەخەودا گڵی گواستەوە بەڵگەیە لەسەر ڕەواندنەوەی غەم و پەژارە لەهاوەڵەکانی.

**گلۆڵەی خوری:** (نابلسی) دەڵێت: بۆ بژێویداران بەڵگەی سوودو قازانج و ڕزق و ڕۆزییە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کرێگرتەی کار بەردەوام و منداڵ یان تەمەنیدرێژ.

**گڵێنەفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە خەریکی قاپ و قاچاغ دروستکردنەو خزمەتکارە یاخود ژنی بەدین و بەرزە.

*شتومەکی گڵکاری بەڵگەیە لەسەر شانازیکردن بەپەچەڵەك و ماڵ و سامان و جوانییەوە.

**گلێنەی سورەوەکراو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گلێنە لەخەودا پیاوێکە خێروچاکەی بۆ دەرودراوسێکانی دەبێت.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی گلێنە بەڵگەیە لەسەر ژن و دەمەوانەو دەسکەکەشی ماڵ و جیهازییەتی لەگەڵ منداڵ ئەگەر مسبوو، ئەگەر لەشووشەبوو بەڵگەیە لەسەر ژنی هەژار یاخود بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی کاروبارو شاراوەو نهێنی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنێك زوو دووگیان بێت و زوو منالی لەباربچێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کەچ و ئاژەڵ یان سەفەر.

گ و

**گوارە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گوارە بۆ پیاوان ئەنجامدانی کارێکە بەگوێ.

*ئەگەر ژنێك یان کچێکی بینی گوارەیەك لەگوێچکەیدابوو بازرگانیەکی بەسوودی لەلایەکی ئاوەدانەوە بۆسەرهەڵدەدات ژنی شۆخ و شەنگی تێدایە.

*ئەو گوێچکەیەی گوارەی تێدایە ژن و کچە.
*ئەگەر دووگوارەی لەگوێچکەیدا بینی بەگەوهەر رووکەشکرابوون جوانی و خۆشی و دنیایە بەدەستدەهێنیّ و قورئان و ئاین و دەنگخۆشی پێدەبەخشریّ لەگەڵ دڵنیایی لەسەرجەم کارەکانیدا.
*ئەگەر لەگەڵ گوارەکەدا پارچەیەکی دی لەگوێچکەیدابوو کچی پێدەبەخشریّ، ئەگەر ژنێکی دووگیان خەوێکی ئاوابیبینی کوڕێکی نێرینەی دەبێت.
*گوارەو پارچە ئاڵتونێك کەبکرێتە گویّ بۆ ژن و پیاو وەك یەك وایە.
*ئەگەر گوارەکە زێڕبوو پیاوێکی گۆرانیبێژە، ئەگەر لەزیوبوو نیوەی قورئان لەبەردەکات.
*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: تاکێك گوارەم لەگوێچکەدا بینی، ئەویش وتی: لەگۆرانیدا چۆنی؟ وتی دەنگم خۆشە.
(نابلسی) دەڵێت: گوارە لەخەودا بازرگانییە بۆیەکێك لەگوێچکەی ژنەکەیدا بیبینیّ یان لەگوێچکەی کچێکدا، ئەگەر لەزێڕبوو هەموو قورئان لەبەردەکات، ئەگەر بەبێگەوهەربوو کوڕەکە بەئاوازەوە گۆرانی دەڵێت.
*ئەگەر ژنێکی رەبەن خەوێکی لەوجۆرەی بینی شوودەکات.
*گوارە لەگوێچکەی منداڵدا جوانییەو بۆ منداڵی بالغ باش نییەو بۆ پیاو لەکەداری کاری ناقۆڵایە زیادوکەمی روو لەئەقڵ و ژیریدەکات.
*ئەگەر چەن گوارەیەکی لەگوێچکەیا بینی قورئان لەبەردەکات یاخود فێری زانیارییەکدەبیّ خەڵکی سوودی لێوەردەگرن.
*گوارە بۆ ژن هاوسەرەو پارچە ئاڵتوونی دی لەگوێچکەدا منداڵەکانیەتی.
*دەگونجێت گوارە لەوەرگەی ئاژەڵ بێت یاخود ئەوەی کەدەخوریّ یان ژنان خۆیانی پێجواندەکەن لەخشڵ و زێڕ.
*ئەگەر گوارەی لەگوێچکەیدا بینی حەز لەبیستنی گۆرانیدەکات یاخود ئامادەی کۆڕی گۆرانیبێژ دەبیّ.

**گواستنەوە:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر گواستنەوەو گۆڕینی حاڵ و باری لەخێرەوە بۆ شەڕو خراپەو لەشەڕەوە بۆ خێر.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زەرەرو زیـان بۆئـەوەی دەیگوێزێتـەوە، سوودیش بێت بۆئەوەی بۆی رەوانە دەکرێت.

*هەروەها دەڵێن: گواستنەوە شەڕو خێری هەڵگرتوە بەیەکەوە.

**گواستنەوەی شتومەك:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی بوە بەفەرمانڕەواو ئەو پۆستەش شایانی نەبێت خراپەو رووداوێکی ناقۆلای پێدەگاتو دوژمنەکانی گاڵتەی پێدەکەن.

(نابلسی)دەڵێت: گواستنەوەی شتومەك لەخەودا بەپێچەوانەوە دەگەڕێتەوە وەك بینینی کەنیسە دەبێت بەمزگەوتو درەختی وشك بەدارودرەختی بەردار دەبێت، ئەوانە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گۆڕینی پلەوپایەداران یان جیاوازی بارودۆخی جیهان لەشەڕو خراپەوە بۆخێروچاکە یاخود بەپێچەوانەوە.

*هەروەها گواستنەوەی ئەندامەکانی لاشەو گۆڕینی شێوازی مرۆڤەکان.

*ئەوەی ببینێ بارگرانەو وانەبێت چاکیو باشییە لەئایینداو دەبێت بەڕێزو شکۆمەندی.

*ئەوەی ببینی بوە بەمناڵ هیچ خێرێکی تێدا نییە لەهەموو حاڵوبارێکداو تووشی نەفامیو نەزانی دەبێت.

*ئەگەر ژنێك بینی پیربوە یان نیمچەپیرەو وانەبێت چاکییە لەئاینو دیندا.

*ئەگەر بینی پیربوەو دواتر بوەتەوە بەلاو ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەنددەبێت ئەگەر لەوانەبوو کەدنیا پشتی تێکردبوو دنیا رووی تێدەکاتەوە، ئەگەر نەخۆشبوو چاکدەبێتەوە.

*ئەگەر بینی شادی گرتوویەتی جوانبوە بەخێرایی دەمرێت.

*ئەگەر بینی لەخەودا بالای درێژبوە ماڵوداراییو وەچەی دەبێت.

*ئەگەر بینی کورتبوە ماڵەکەی یان مالآت یا ئۆتومبیلەکەی دەفرۆشێت.

*ئەگەر کەموکوڕی بینی لەبەشێك لەئەندامەکانیشدا بینی لەکەمو کوڕییە لەئایندا.

*ئەگەر بینی چوەتە سەر شێوەی ژنێك بەلاو نەهامەتیو ملکەچی رووی تێدەکات مەگەر لەخەوەکەیدا وەك خۆی لێبێتەوە.

* ئەگەر بینی عەورەتێکی هەیە وەك عەورەتی ژن ملکەچیو سەرشۆڕی ڕووی تێدەکات.

* هەروەها دەڵێن: ئەگەر لەبەربەرەکانیکارانبوو باشاشتی لەگەڵ رکەبەرەکانی بکات چونکە بەڵگەیە لەسەری ئەگەر ئاشتبوەوە لەگەڵی داواونیازی بەدەستدێت.

* ئەگەر ژنێك بینی عەورەتی وەك پیاوی هەیە یان ریشی هەیە ئەگەر کوڕێکی غەریبی هەبوو پەیوەندی پێوە دەکاتەوە، ئەگەر دووگیانبوو کوڕی دەبێت، ئەگەر دووگیان نەبوو هەرگیز کوڕی نابێت، ئەگەر منالیبوو کوڕەکەی دەمرێت بەرلەوەی بالغ بێت، دەگونجێت لێکدانەوەکەشی بگوێزرێتەوە بۆ پیاو بژێوی پەیداکەری باسی بەباشەو چاکە دەکرێت بەئەندازەی گەورەیی ئەو عەورەتە.

* ئەگەر ژنێك بینی پیاوێك لەگەڵ ژناندا جووت دەبێت لێکدانەوەکەی بۆ بژێوی پەیداکەری دەبێتو پلەوپایەو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت.

* ئەگەر بینی کلك یا شاخ یان سمو پەرچەمی هەبێت لەلێکدانەوەدا باشە.

* هەروەها ئەگەر بینی دەنووكو شفرە یا لمۆز یا هەرشتێکی زیادەی لاشەی هەیە هەمووی دنیایەو بەباشە دەگەڕێت (پشت بەخوا).

* ئەگەر بینی ئەندامێکی گوێزراوەتەوە بۆ جەستەی ئاژەڵێك ئەگەر درندەبوو زاڵدەبێت بەسەر بەرانبەرەکەی بەماڵو سامان یا بەدەستەلآت یاخود بەپلان یان بەفێڵو تەڵەکە، ئەگەر بوو بەئاژەڵێکی گۆشتخۆر بەڵگەیە لەسەر خێروچاکەی، یان رسواییوسووکی.

* ئەگەر بینی وەك باڵندە پەروباڵی هەیە پلەوپایەو خێری بەدەستی دەهێنێت.

* ئەگەر بینی بەباڵەکانی دەفڕێ بەپلەوپایەداریی سەفەر دەکات بەئەندازەی بەرزبوونەوەی بەسەر زەویدا.

* ئەگەر بینی لەشولاری بوە بەگلێنە یان شووشەو فەخفوری نامێنێت.

* ئەگەر بینی بوە بەئاسن تەمەنی درێژدەبێت.

* ئەگەر بینی بوە بەتاقو پردو خەڵکی بەسەریا دەپەرنەوە دەبێت بەفەرمانڕەوا یان هاوچەشنی ئەو یاخود بەزانایەكو خەڵکی لەکاروبارەکانیدا پەنای بۆ دەبەن.

*ئەگەر بینی بوە بەگۆچان و گالۆك لەخەودا خێری تێدا نییەو خراپەیە لەئاین دنیایدا.

*ئەگەر بینی بوە بەگۆچان خێری تێدا نییە خراپەیە لەئاین و دنیایدا مەگەر شوێنکەوتەبێت لەئاینیدا.

*ئەگەر یەکێك منداڵی نەخۆشی هەبێت و ببێت بەباڵندە دەمرێت.

*ئەگەر بینی بوە بەمەیمون یان هاوشێوەی ئەوە لەناوچوونی نازونیعمەتە.

*ئەگەر بینی بوە بەوشتر یان ئاژەڵ یاخود درندە یان هاوچەشنی هیچ خێرێکی تێدا نییە لەئایندا بەتایبەت لەهەموو حاڵێکدا.

*ئەگەر بینی بوە بەباڵندە دەبێت بەکەشتیار لەسەر زەوی‌داو حەز لەسەفەر دەکات و، بژێوی لەبژێوی ئەو باڵندەیە دەکات.

*ئەگەر بینی بوە بەدرندەیەك لەکۆمەڵی موسوڵمانان جیادەبێتەوەو گۆشەگیردەبێت.

*ئەگەر بینی بوە بەئاسك لەبژێویدا خێر دەبینێ لەژن و منالآن.

*ئەگەر بینی بوە بەملنگا یان درندەیك خێر لەژن وەردەگرێت.

*ئەگەر بینی بوە بەبەراز بژێوی زۆردەبێت و خۆی ملکەچدەبێت.

*ئەگەر بینی بوە بەجاڵجاڵۆکە بەندایەتیدەکات و تەوبەو پەشیمانی لەتاوان و گوناهێکی زۆر دەردەبڕێت.

**گواستنەوەی شتومەك بۆ شوێنی باشتر:**
(نابلسی)دەڵێت: ئەو خەونە بەڵگەیە لەسەر فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە، ئەگەر گواستیەوە بۆ شوێنی نزمتر بەڵگەیە لەسەر رێگری لەچاکەو فەرمان بەخراپە یان گۆڕینی خراپ بەچاکە یا چاك بە خراپە.

**گورچیلە:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: هەردوو گورچیلە شوێنی دەوڵەمەندی و راستی و رەوانبێژی و هەڵەیە.

*ئەگەر بەقەڵەوی بینی پیاوێکی دەوڵەمەندی خاوەن دواندن و راستییەو لاوازی گورچیلەکانیش هەژاری و هەڵەی راوبۆچوونە.

*هەروەها دەڵێن: گورچیلە خزمایەتییە، باشی و خراپیان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا هاوکارو یارمەتیدەرە، لەدەستدانی گورچیلەیەك لەدەستدانی یارمەتیدەرو پەناو پشتگیرە، لەدەستدانی هەمووشیان بەڵگەیە لەسەر مردنی.

* هەردوو گورچیلە پیاوێکی بەهێزو توانایەو لەکاری فەرمانڕەوادایەوماڵو سامانە بۆ خەڵکی خەرجدەکرێ.
* هەروەها بەڵگەیە لەسەر پەنجەکانی مرۆڤ.
**گورگ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گورگ دوژمنێکی ستەمکاری درۆزن و دزو ناپاکە، ناپاکی ئەنجامدەدات لەگەڵ هاوەڵەکانی و فرووفێڵیان لەگەڵدەکات.
* ئەگەر گورگێك بچێتە ماڵەکەی دز ڕوو لەماڵەکەیدەکات.
* گۆڕینی دز لەشێوازی خۆیەوە بۆ شێوازێکی تری تازەڵی دزێکە تەوبە دەکات و پاشگەزدەبێتەوە.
* ئەگەر توولەگورگی بینی بەخێویدەکات ئەوە منداڵێکی فڕێدراو لەوەچەو پشتی دزێك بەخێودەکات و تێکچوونی ماڵ و حاڵەکەی لەسەر دەستی ئەو منداڵەدا دەبێت.
* هەروەها دەڵێن: ئەوەی گورگێك ببینێ پیاوێکی پاك و تاوانباردەکات بەپێی چیرۆکەکەی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت) لەبەرئەوەی دز ترس و بیم و لەکیسچوونی کاروبارە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر گورگێکی بینی بوە بەگا منداڵێکی دز دەبێت بەپیاوێکی دادپەروەری بەخشندە.

* هەروەها دەڵێن: ئەوەی لەخەودا گورگێك ببینێ گوتارێکی باشدەبیستێ لەلایەن گەورەکەیەوە یاخود خێرێك بەدەستدەهێنێت، بەڵام ئەگەر ڕاویکرد شادی و خۆشی بەدەستدەهێنێت لەگەڵ شەهیدبووندا.
* گورگ بەڵگەیە لەسەر ڕۆژەکانی ساڵ چونکە گورگ شوێنی گورگ دەکەوێت بەیەك ڕێگەدا ئەگەر لەناویك پەڕینەوە هەروەها چۆن ڕۆژەکانی ساڵ بەدووی یەکدا دێن.
* هەروەها گورگ بەڵگەیە لەسەر دوژمنێکی دز کاروکرداری ئەو ئەنجامدەدات بەئاشکرا.
* ئەگەر بینی بوە بەگورگ لەخەودا شادی و خۆشی بەدەستدەهێنێت.
* شیری گورك ترس و بیم و بەسەرچوونی کاروبارە، گورگ دەستەلاتدارێکی ناپاك و بێ وادەیە، یاخود دزێکی کزو لاوازە یان پیاوێکی درۆزن و بێ بەڵێنە.
* ئەگەر لەخەودا سەگێکی بینی لەگەڵ گورگدا یەکیانگرتوە بەڵگەیە لەسەر دووڕوویی و ناپاکی و دەستبڕین.
**گوشەر:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر گوشەرێك دانرا لەشارێکدا بەڵگەیە لەسەر:

+فەڕو پیت لەو شارەدا.
+نەبوونی قات و قڕی.
+مەرگی شیردەر.
* هەروەها لەخەودا ئەگەر گوشەری قامیشی شەکربوو بەڵگەیە لەسەر دنیاو رووتێکردنی بەهۆی رزق و رۆزییە جیاوازەکانەوە.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+ئەسپەردەکردن.
+ماڵ وسامان.
+سوودو قازانج بڵاوکردنەوە.
+بڵاوبوونەوەی زینندانیان و دەرچوون لەناڕەحەتی و قەیران.
+حەمام.
+قوتابخانە.
+خەڵوەتگەو تەکیە.
* گوشەری زەیت بەڵگەیە لەسەر رێنومایی گومڕاو زانیاریی بۆ قوتابی.
* هەروەها گوشەر بەڵگەی خێرە بۆ شیردەری منداڵ.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی خاوەن ماڵ و دارایییە. ئەگەر بینی کونجی گوشی ماڵ و سامانی لەزیادبوندادەبێت هەروەها گوێزیش هەر بەوچەشنەیە.
* گوشین بەڵگەیە لەسەر نیشتمان، ترشیاتکار پیاوێکە لەخەڵکی خواناس نزیکدەبێتەوەو رمان بەسەر خەڵکیدادەدات خۆیان بەدووربگرن لەخۆشیەکانی دنیاو هاوکارییان دەکات لەسەر خواناسی.
* گوشەی رۆنی گوێز پیاوێکی رەنجبەرو ماندوەو خاوەن ماڵ و دارایییەکی نەشن ونماکارە.
* گوشەری تری بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی ئاین و فیتنەو ئاشوب.
* گوشەری رۆن بەڵگەیە لەسەر دەروولێکردنەوەو قوتاربوون لەغەم و پەژارەو زانایان و لێکۆڵەرەوان و بینینی بەڵگەیە لەسەر:
+ئالودەبوونی حەزو ئارەزوو.
+بیدعەکاری.
+بەجێهێنانی کاری نابەجێ.
* بینینی بەڵگەیە لەسەر رێنومایی و دەرچوون لەتاریکاریی و روو بەنورو روناکی چوون.
* هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر رزق و رۆزی و سوودو قازانج.
**گوڵ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گوڵ کوڕ یان ماڵێکی رێزدارە ، هەروەها دەڵێن: گوڵ بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی ئاوارەیەك یان هاتنی کتێبێك.
* هەروەها دەڵێن: گوڵ ژنێکە لەمێرد جیابوەتەوە یان کوڕێکی دەمرێ یاخود

بازرگانییەکە بەردەوام نابێت یان خۆشیی و شادییەکە بەهۆی زوو هەڵوەرانی گوڵەوە تیادەچێت.

*ئەگەر بینی لاوێك گوڵێكی پێدا دوژمنێكی بەڵێنی پێدەداتو بەردەوام نابێت لەسەری.

*ئەگەر تاجەگوڵینەیەکی لەسەرسەری بینی ژنێك دەهێنێو بەخێرایی ئاژاوەو ناتەواویی دەکەوێتە نێوانیان.

*ئەگەر ژنێك خەوێكی وای بینی مێردە بەوسیفەتەوە.

*گوڵی راخراوو خۆشیی دنیایە بەبینەوەی هێزو مانەوەی هەبێت.

*بڕینی گوڵەباخ غەمو پەژارەیەو گوڵ لێکردنەوە خۆشییە.

*لێکردنەوەی گوڵی سپی لەبێستاندا ماچکردنی ژنێکی داوێنپاکە ، ئەگەر گوڵەکە سوورییوو ژنەکەی خاوەن ئارەزوو خۆشیو شلەییە.

*ئەگەر گوڵەکەی بەزەردی بینی ژنێکی نەخۆشە ، لێکردنەوەی خونچە کەهێشتا نەکراوەتەوە بەڵگەیە لەسەر لەبارچوونی کوڕ ، هەروەها دەڵێن: گوڵ باسکردنی باشە، ئەگەر گوڵێکی کەلا کەورەی لێکردەوەو گوتی خراپە بەرانبەر ژنێکی شۆخو شەنگ دەکرێو بێتاوانە لێی.

*هەندێکدەڵێن: بۆنداران زۆروکەمی غەمو پەژارەیە، گوڵ گریانو غەمو پەژارەیە ئەگەر ئەو شوێنەی ببینرێ کەتێدا ناسراوە بێنەوەی دەستی لێبدات یان لێیبکاتەوە.

*رێحانە گریانە ئەگەر لەشوێنی خۆی هەڵکەنراو نەما.

*بەهەمان شێوە گوڵو مۆردو ئەوەی بۆنو بەرامی هەیە لەگەڵ پاقلەو ئەوەی رەنگەکانی نابژێرێ غەمو پەژارەیە خواردنی پاقلەواتیش غەمو پەژارەیە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی گوڵی چنییەوە رێزو خۆشەویستیو نازو نیعمەت بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر لەباخێکدا گوڵی سووری چنییەوە بەڵگەیە لەسەر زیرەکیو بیرساغیو نزیکبوونەوە لەخەڵکیو نەرمو نیانی.

*گوڵ بەڵگەیە لەسەر خۆشیو شادی.

*ئەگەر نەخۆشێك گوڵی راخراوی لەژێر خۆیدتا بینی یان جلوبەرگی گوڵینی پۆشی دوای چل رۆژ دەمرێت چونکە ماوەی مانەوەی گوڵ ئەوەندەیە.

*گوڵەباخ بەڵگەیە لەسەر کۆمەڵێکی بۆڵەبۆڵکارو کرداری غەمو پەژارەهێنەر.

* گوڵچنینەوە خۆشحاڵییەو دەگونجێت گوڵی زەرد بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی هی سووریش جوانیبێت.
* دەگونجێت گوڵی سپی بەڵگەبێت لەسەر درهەمو هی سوور دینار.
* گوڵی سوور دیارو بەهێزترە لەبەڵگەدا.
* لەخەودا چێژو خێرە، ئەگەر بینی تاجەگوڵینە بەسەریەوەیەتی ژندەهێنێتو تامو چێژ لەدنیادا بەدەستدەهێنێت.
* ئەگەر گوڵی بینی بەڵام لەکاتی خۆیدا نەبوو غەمو پەژارە رووی تێدەکات.
* ئەگەر گوڵ هەڵبگرێو لەدەستبڕەکان بێت ئەوە دەستگیردەکرێ، نەخۆشدەمرێو گوڵی هەمەڕەنگو جۆراوجۆر بەڵگەیە لەسەر دنیاو خۆشیەکانی.
* گوڵ مژدەی دووگیانبوونی ژنانە لەگەڵ دەرووڵێکردنەوەو رەواندنەوەی غەمو پەژارە.

**گولاو:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گولاو ماڵو پیاهەڵدانو لەشساغیو چاکییە.

**گولاوپرژێن(عەتردان):** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:
+لابردنی ئەوەی کارێکی پێسپێردراوە.
+چاکبوونەوەی نەخۆش.
+سەفەر بۆئەوەی خوازیاری سەفەرە.
+سەرکەوتن بۆ شەڕگەران.
+شاییو ئاهەنگی هاوسەرگیرو هاوچەشنی.
* یاخود کچو ژنو منداڵە، هەروەها دەڵێن: گەنجینەدارە ئەگری خەرجی ماڵی پێسپێراوە.

**گوڵە بەیبوونە:** گوڵە بەیبوونە ناوەڵزاوای پیاوە، ئەوەی ببینێ گوڵە بەیبوونە لێدەکاتەوە هەندێك لەخزمەکانی هاوسەرەکەی دەکەن بەهاوڕێی خۆیان.

**گوڵەشلێر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گوڵەشلێر پیاهەڵدانی باشە، هەندێکدەڵێن: بەڵگەیە لەسەر خراپە چونکە ناوەکەی لە(سوء - خراپە)وە سەرچاوەیگرتوە.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر رێبازو سوننەت یان خراپە، هەروەها دەڵێن: ئەگەر لەخەودا گوڵەشلێری بینیو پێیدرا خراپەی ساڵێکە.

**گوڵەگەنمو جۆ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گەنمو جۆی دەستی مرۆڤ یان سەرخەرمان یاخود کۆکردنەوەی لەدەفرێکدا ماڵو سامانێکە بەدەستیدەهێنێت لەکارو پیشەی کەسانیتر یاخود زانیارییەکە فێردەبێت.

*ئـەوەی گوڵەگـەنمو جـۆی پـەرش‌و بـڵاوی هەڵگرتـەوە لەزەویداو خـاوەنی زەوییەکەی ناسیەوە مـاڵێکی پـەرش‌و بلاوی لەهاوەڵێکەوە دەستدەکەوێت.

*ئەگـــەر بینـــی کـــشتوکاڵەکەی کەدەدورێتـەوە لـەکاتی خۆیـدا نییـە بەڵگەیە لەسەر مردن لەو شوێنە یاخود لەجەنگدا، ئەگەر گوڵەگەنمـەکان زەردو ئـاڵتوونیبوون بەڵگەیـە لەسـەر مـەرگی پیاوە بەتەمەنـەکان ، ئەگـەر سـەوزبوو مەرگی لاوو کوشتنیانە.

(نابلسی)دەڵێـت: بینینـی کـشتوکاڵی سەوز بەڵگەیە لەسەر ماڵێکی جـەمکراو کـەزیاد دەکـات، گوڵەگـەنمی سـەوز بەقەدەکەیەوە رزق‌و رۆزی‌و فەرپیتـە، گوڵەگەنمی وشـکیش نـەبوونی‌و قـاتی‌و قرییە.

*دەگونجێـــت گوڵەگـــەنم بەڵگـــەبێت لەســـەر نارەحـــەتی هـــەروەك چـــۆن گوڵەگـــەنمو جـــۆ بەڵگەیـــە لەســـەر زیادبوونی پاداشت.

*دەگونجێت گوڵەگەنمـەکان بەڵگـەبێت لەســـەر ســـاڵانی دنیـــا بـــەمانگو رۆژەکانیەوە.

*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر ماڵ‌وسامانی دنیا لەگەڵ گەنجینە.

**گوڵێك:** لەخەودا ژنێکی جوانە، ئـەوەی بیبینـیّ ژنێکـی شـۆخ‌و شـەنگو جـوان دەستنیـــشاندەکات خـــەڵکی پێـــی سەرسامدەبن‌و ئەو ژنەش خزم‌و کەسی خۆی نییە.

*هەروەها لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+ئامرازەکانی کەیفـو خۆشی دەربڕین.

+پێکـەنین‌و وێنـەگرتن‌و جل‌وبـەرگی جوان‌و رازاوەیە.

*دەگونجێت هاوسەرگیری ئەنجامبدات یاخود گۆرانیبێژێك بەکرێ بگرێ.

*ئەگەر بینی تێکەڵ بـەمانگبوە یـاخود هاتۆتە خـوارەوە یاریکردنـە بەمنـداڵان یـــاخود دەگونجێـــت کەســـی شـــێت‌و گێلبێـــت کـــەواهیچ ســـوودو قـــازانجی لەقسەو گفتوگۆیا نییە.

*هەروەها ژنی پادشاو بەرپرسە.

*هـــەروەها دەڵـــێن: ژنێکـــی بیانییـــە، ئەگەر بینـی‌و رەبـەنبوو ژنێکـی بـەدەر لەنەتـــەوەو زوبـــانی خـــۆی دەکـــات بەهاوسەری.

**گومـان( دوودڵـی ):** (نابلـسی) دەڵێـت: لەگوتەی پەروەردگاردا هـاتوە بەڵگەیـە لەسەر دووڕووی‌و فرۆفێڵ‌و چاوبەست. دەگونجێـــت دووڕوبێـــت‌و خوداوەنـــد لـــەرۆژی قیامەتـــدا تەماشـــای نـــەکات یـــــاخود هاوســـــەری داوێنپـــــاکی تومەتباربکات.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا گوناه بەپێی ئایەتی: ﴿ انَّ بَعْضَ الظَّنِ اثْمٌ﴾ (الحجرات: ١٢).

**گومەز:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: گومەزمێزە، ئەگەر بینی گومەزێکی لەسەر هەور دروستکرد دەستەڵاتو هێزی دەستگیردەبێ.

*ئەگەر بینی بیناو ساختمانی هەیە لەنێوان ئاسمانو زەویو چەندین گومەزی سەوزی تێدایە باشی حاڵوبارو مردنییەتی بەشەهیدی.

*بیناو سلختمان دروستکردن بەڵگەیە لەسەر هێنانی ژن.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی بینایەك دروستدەكات هاوڕێو خزمە نزیكەكانی لەخۆشیدا كۆدەكاتەوە.

*ئەگەر بینی گڵكاری گۆڕی پێغەمبەریكرد (ﷺ) بەماڵو پارەیەك (حەج)دەكات.

*ئەگەر خشت كۆكرابووەوە بەڵام لەبیناسازیدا بەكار نەدەهێنرا پارەوپوولە.

*ئەگەر بینی بینایەكی كۆن نوێدەكاتەوە بۆ زانایەك باسوخواسی ئەو زانایە دووبارە دەهێنێتەوە پێش.

*ئەگەر ساختمانو بیناكە هی فیرعەونبوو یان ستەمكارێك نوێكردنەوەی باسو خواسییەتی.

*پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: "ئەگەر لەخەودا بینی بینایەك دروستدەكات كردارێك ئەنجامدەدات".

*ئەگەر بینی دەستیكردوە بەدروستكردنی بینایەكو لەبناغەوە چاڵیكردو بینایكرد هەتا بەرزو بڵندیكردەوە دلوای زانیاریو دەستەڵاتو پیشەیەكدەكاتو پێداویستی خۆی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی بینایەك دروستدەكات لەشارێك یان گوندێك لەو شوێنەدا ژنێكدەهێنێ، ئەگەر لەشووشە دروستیكرد خۆڕازاندنەوەو رووپامایییە، ئەگەر لەقوڕ دروستیكرد حەڵاڵو بژێوییە.

*ئەگەر نەخشداربوو دەستەڵاتو زانیاریو شادیو خۆشییە ، ئەگەر لەگەچ دروستیكرد یان لەخشتو وێنەی لەسەربوو روو لەقسەو وتەی پووچو بەتاڵدەكات.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ژنێكە هێناویەتیو مارەبییەكی زۆریداوە، ئەگەر گومەزێكی رووخاندو ژنەكەی نەخۆشبوو دەمرێ، ئەگەر لەشساغبوو تەڵاقیدەدات.

*گومەز دەستەڵاتە بۆیەكێك خاوەنی بێت یان بچێتە نێوی.

*ئەگەر كۆمەڵە گومەزێكی زۆری بینی یان دروستیكرد لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەرزبوونەوەی پلەوپایەی یان چوونە ریزی چارەنووسدارانەوە.
*ئەگەر گومەزو باڵندەی بینی بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەو شكۆمەندی.
*گومەزی لەخشتدروستكراو دەستەلاتدارە.
*ئەگەر بینی گومەزێكی خشتی لەسەر دروستكراوە بەزووترین كات دەستەلاتێكی پرشكۆو شانازیو شكۆمەندی دەستگیردەبێ.
*گومەز لەماڵدا ژنێك یان رێكوپێكییە لەلایەن ژنەوە.
*پیاوێك دەڵێت: لەخەودا بینیم گومەزێك دروستكرابوو چوار پیاو رووخاندیان، رافەكاری خەویش وتی: زانایەك دەمرێ، دوای دوو رۆژ یەكێك لەزانایانی گوندێكی (دمشق)مرد.
**گون:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: جووتە گون پەتو هۆكاری دوژمنەو بەهۆیەوە دەگەن بەمەردووم.
*ئەگەر هەردووگونی بینی برابوو بەبێئەوەی بۆگەن بكەن یا زیانیان پێبگات دوژمنەكانی زەفەری پێدەبەن بەئەندازەی ئەوەی تووشی هەردووگونی هاتوە، ئەگەر گونەكانی بینی گەورەبوون یاخود هێزو توانایەكی زیاتریان هەیە لەهی خۆیان دوژمنەكانی ناتوانن زیانی پێبگەیەنن.
*ئەگەر بینی گونی بەخشیوە بەكەسانیتر بەویستیو ئەوەی لێدەركەوت كورێكی دەبێت بەنادروستیو دەدرێتەپاڵ یەكێكیتر.
*ئەگەر گونەكانی بەدەستی پیاوێكی ناسراوەوە بینی زەفەری پێدەبات، ئەگەر ئەو پیاوە لاوبوو دوژمنێتی.
*ئەگەر شیری تێهات ماڵو دارایییەك بەدەستدەهێنێت دڵنیا نابێت لەدوژمنەكانی.
(نابلسی) دەڵێت: جووتەگون شوێنی چێژو خۆشینو، دەگونجێت بەڵگەبێت:
+هەردوو هاوسەر.
+دووكوڕ.
+دووپیشە.
+دوو دەرگاوان.
*ئەگەر بینی هەردوو گونی كەوتوونەتە دەستی دوژمنەكانی بەو ئەندازەیە دەستیان پێدەگات.
*دەگونجێت جووتە گون بەڵگەبێت لەسەر دوو خوشكو دوو كچو دوو هاوسەر یان دایكو پوور.
*ئەگەر گونەكانی بینی بڕاون ئەگەر دوو نەخۆشی هەبوو دەمرن، ئەگەر دوو هاوسەری هەبوو دەمرن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵو دارایی، ئەگەر بینی گونەکانی براون پارەیەکی لێداوا دەکرێتەوە، ئەگەر هیچی نەبوو رەچەڵەکی دەبچڕێو رزقو رۆزی ئەستەمو دەبێتو نیعمەتی خوایی لێدەسەنرێتەوە.

*ئەگەر بینی بەویستی خۆی گونی بەخشیوەو لێی بووەوە کوڕێکی دەبێتو نادروست دەبێتو کوڕەکەی دەدرێتە پاڵ کەسێکیتر.

*دەگونجێت جووتە گون بەڵگەبێت لەسەر:

+جموجووڵ.

+ئەوەی مرۆڤ لەسەری دەنوێت لەسیسەم یا دەیخاتە ژێرسەری لەسەرین.

*ئەگەر ژنێك بینی دوو عەورەتی هەیە دەگونجێت دوانەیەکی ببێ.

*ئەگەر پیاوێك بینی جووتە گونی هەر نییە یاخود بەهۆی نەخۆشییەوە براون بەهۆی دەردە شێرو دەردە رێوی دەگونجێت ژنەکەی تەلاق بدلت یاخود منداڵێکی لەدەستبدات یا بژێویو کاروکاسبی کەمو کوڕی تێبکەوێت، ئەگەر ئیشوکاری کێشانە بکات کێشانەکەی دەشکێ، ئەگەر هاوسەرداربێ گەورەی ژنەکەیو خزمی نزیکی لەدەستدەدات، یاخود دەگونجێت لەخۆ پارێزیەوە بچیت بۆ خوار ئەوە.

**گوناهو تاوان**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەنجامدانی گوناهو تاوان بەڵگەیە لەسەر قەرزکردنی خاوەنەکەی هەروەك چۆن قەرزکردن بەڵگەیە لەسەر گوناهو تاوان.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا قەرزە، ئەگەر کۆمەڵێ گوناهو تاوان ببینێ کۆبوەتەوە لەسەری قەرزە، داننان بەگوناهو تاواندا مەزنیو رێزداریو شکۆیە.

**گوناهو تاوانی بچووك:**

(نابلسی)دەڵێت: شارەزاییە لەخراپەکارانو بەڵگەیە لەسەر لێخۆشبوون لەتاوانەکان بەپێی ئایەتی: ﴿إِلَّا اللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ﴾(النجم:٣٢).

**گوند( لادێ)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: گوندێکی ناسراو بەڵگەیە لەسەر خۆی یان دانیشتوانەکەیو ئەوەی لێوەی دێت چونکە هەموو شوێنێك بەڵگەیە لەسەردانیشتوانەکەی هەروەك پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَاسْأَلِ الْقَرْيَةَ﴾ (یوسف: ٨٢) واتە لەدانیشتوانەکەی بپرسە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لانەی ستەمو بیدعەو خراپەو دەرچوون لەکۆمەڵو نامۆبوون لەراوبۆچوونی دانیشتوانی شاردا هەربۆیە خوداوەند باسی رۆڵی ستەمکارانی چواندوە لەگوندەکاندا.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+لانەو ماڵی مێروولە.

+گوند خۆی.

*ئەگەر ئەو گوندە ناسراوبوو دەستەڵاتدار دەدات بەسەریا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+كوللە.

+سەرما.

+دەردو نەخۆشی.

+پركردنەوەی كونەمێروولەو لەسەربانی ماڵدا.

*ئەگەر بینی چوەتە نێو گوندێكی تۆكمەو قایم دەكوژرێ یاخود كوشتار بەرپادەكات بەپێی ئایەتی: ﴿لاَيُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعاً الاَّ فِي قُرَى مُحَصَّنَة﴾ (الحشر: ١٤).

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی لەشارەوە دەچێت بۆ گوند كارێكی سووكو نزم هەڵدەبژێرێ بەسەر كارێكی قورسو گراندا یاخود كارێكی دیاریكراو ئەنجامدەدات وادەزانێ سنووردار نییە یاخود خێرێك ئەنجامدەدات وادەزانێت شەرو خراپەی كردووەو پاشگەزدەبێتەوە لێیو سوودی نییە لەبۆی.

*ئەگەر بینی چوەتە نێو گوندێك دەستەڵاتێك بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر لەگوندێك هاتەدەرەوە بەجێیهێشت لەناڕەحەتی قوتاردەبێتو پشوودەدات بەپێی ئایەتی: ﴿ اخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ اهْلُهَا ﴾ (النساء: ٧٥).

*ئەگەر بینی گوندێكی ئاوەدانو وێرانبوو كشتوكاڵو كێڵگەكان كاولبوون بەڵاو نەهامەتییە بۆ خاوەنەكانی، ئەگەر بەئاوەدانی بینی چاكی ئاینی خاوەنەكەیەتی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ستەمو تیاچوونە بەپێی ئایەتی: ﴿ قَالُوا انَّا مُهْلِكُوا اهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ انَّ اهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ﴾ (العنكبوت: ٣٦).

*ئەگەر بینی لەگوندێك دێتەدەرەوە چاكییە بۆی لەئایندا.

*ئەگەر بینی لەگوندەوە دەچێ بۆ شار لەماندوبوونەوە دەچێت رووبەپشوو لەترسەوە بۆ دڵنیایی.

*ئەگەر بینی لەشارەوە دەچێت بۆ گوندێك پێچەوانەی ئەوەیە.

**گوێ**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: گوێ هاوسەری پیاوە یان کچەکەیەتی، ئەگەر بینی سێ گوێچکەی هەیە بەڵگەیە لەسەر ژنێكو دوو كچ، ئەگەر چوار گوێچکەی هەبوو خەوەکەی دوو لێکدانەوە هەڵدەگرێت:

١)دەگونجێت چوار ژنی هەبێت.

٢)چوار کچی بێ دایکی هەبێت.

*ئەگەر بینیی گوێچکەکانی بەدەرکەوتووە ئەوا ژنەکەی تەڵاقدەدات یان کچەکەی دەمرێت.

*ئەگەر بینی یەك گوێچکەی هەیە کەسێکی نزیکی دەمرێت.

*ئەگەر بینی خاوەن نیو گوێچکەیە خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر مردنی ژنەکەیو هێنانی ژنێکیتر.

*ئەگەر بینی لەیەکێك لەگوێچکەکانیدا ئەموستیلەیەك هەڵواسراوە کچەکەیدەدات بەشوو منداڵێکی نێرینەیدەبێت.

*هەروەها وتویانە: ئاین گوێچکەیە، ئەگەر بینی گوێی ئاخنی بەشتێك بەڵگەیە لەسەر بێباوەڕی، ئەگەر بینی خاوەن چەن گوێچکەیەکە حەقو راستی بۆ دەخرێتەڕوو ، بەڵام پێی قایل نابێت بەپێی ئایەتی: ﴿أَمْ لَهُمْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ (الأعراف: ١٩٥).

*هەروەها وتویانە: ئەگەر کەسێکی دەوڵەمەند چەن گوێچکەیەکی جوانی هەمە چەشنی بینی گوێبیستی هەواڵی خۆشدەبێت، بەڵام ئەگەر گوێچکەکان هەمە چەشنو جوان نەبوون هەواڵی ناقۆڵاو خراپ دەبیستێ.

*ئەوەی چاو لەگوێچکەکانیدا ببینێ تووشی کوێریدەبێتو ئەوشتانەی بەدی دەکات بەچاوەکانی بەگوێ دەیبیستێ.

*هەروەها وتویانە: ئەوەی ببینێ خاوەن چەن گوێچکەیەکە زۆرباشە بەتایبەت بۆ ئەوانەی دەیانەوێت کەسێك گوێڕایەڵیان بکات وەك ژنو منداڵو خزمەتکار، بەڵام بۆ دەوڵەمەند بەڵگەیە لەسەر هەواڵی خۆش ئەگەر گوێچکەکان جوانو هەمەچەشنبوون، بەڵام ئەگەر جوانو باشو هەمەچەشن نەبوون بەڵگەیە لەسەر هەواڵی ناخۆش، بۆ زەبوونو کەسانی ناکۆكو دووبەرە بەڵگەیە لەسەر بەندایەتیو بەردەوامبوونیو لایەنی ناکۆکیش بەڵگەو بڕیار بەسەریا دەچەسپێنێ.

*دەگێڕنەوە کەسێك بینی لەخەودا خاوەنی دوانزە گوێچکە زیاترە، خەوەکەی لای خەولێکدەرەوەیەك

گێڕایەوە ئەویش وتی: ئەگەر ئەوکەسەی خەوەکەی بینیوە خاوەن بڕیاربێت بەسەر کەسانیدیدا خێرو چاکەی زۆری پێدەگات، خۆئەگەر دەوڵەمەندبێت هەواڵی پێدەگات بەئەندازەی گوێچکەکانی لەولاتانەوە بەهۆی بڕێوییەوە، ئەگەر زەبوونیشبوو غەمو پەژارە رووی تێدەکات، ئەگەر ناحەزو دوژمنداربێت دادوەر فەرماندەدات بەسەریا بەبڕیاری گرانو وتەو گوتەی زبرو رەقیش دەکات بەرانبەری، ئەگەر ناکۆکیشبوو زاڵو سەرکەوتوودەبێت بەسەر نەیارو ناکۆکەکانی.

*(نابلسی)دەڵێت: گوێچکە شوێنی بێداریو پلەوپایەیە بۆیە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر منداڵو ماڵو سامانو پلەوپایە. دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانیاریو ئەقڵو دینو دەستەڵاتو خزمو کەسو کار کەمرۆڤ پێوەیان جوانو رازاوە دەبێت ، ئەوەشی ببینێ گوێچکەی گەورە بووە یان جوان بووە یاخود رووناکی لێوە دێتە دەرەوە یان دەچێتە نێوی بەڵگەیە لەسەر رێنوێنیو گوێڕایەڵی بۆ پەروەردگارو وەرگرتنی بڕیارو فەرمانەکانی.

* ئەگەر بینی لەخەودا گوێچکەی بچووکەو بۆنی ناخۆشی لێدێتەدەروە یان دەچێتە ناوەوە بەڵگەیە لەسەر خراپە، دەگونجێت گوێی زیادەش بەڵگەبێت لەسەر رێگەدانو مۆڵەت پێدان، ئەگەر گوێچکەکانی جوان بوو ئەوەی دەیەوێت باشو چاکە.زۆری گوێچکە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هونەری زانستەکان یان جێگیر نابێت لەسەر حاڵو بارێك.

*دەگونجێت گوێچکە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی دەچێتە نێویەوە.

*ئەگەر بینی گوێچکەکانی بووبوو بەگوێچکەی هەندێك لەئاژەلان پلەوپایەکەی لەدەستدەداتو رێزو شکۆمەندی کەمدەکاتو بیستنی سارددەبێت.

*ئەگەر بینی هەردوو پەنجەی خستۆتە گوێچکەیەوە بەڵگەیە لەسەر مردنی بەبیدعەوە، ئەگەر بیدعەچیبوو بەڵگەیە لەسەر مەرگیو سووربوونی لەسەر وازلێهێنانی ئەوەی ئەنجامیداوە یاخود دەبێت بەبانگبێژ.

*گوێی پادشاو فەرمانڕەوا سیخورەکانیەتی.

*گوێچکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شتی تێدەکرێ لەکیسەو سندووقو گەنجینە.

*ئـەوەی ببینـێ بەباشـی ببیـستێ بەڵگەیـە لەسـەر تێگەیشتن‌و راسـتی‌و ئاین‌و دڵنیایی.
*ئەوەی ببینـێ کـەڕە بەڵگەیـە لەسـەر تێکچوونی ئاینی.
*ئەوەی ببینێ گوێچکەی بڕاوەو کـەس نەزانێت یـەکێك ژنەکـەی یـان کـچەکەی هەڵدەخەڵـەتێنێ، ئەگـەر چاك‌و بـاش بـوەوە ژن‌و کـچەکەی تەوبەدەکـەن‌و پاشگەزدەبنەو دەگەڕێنەوە بۆچاکە.
*ئەوەی ببینـێ لەچڵك‌و پیسی گـوێی دەخـــوات زینـــا لەگـــەڵ منـــاڵ‌و نێرینەدادەکات.
**گوێبیستی پشکنینی پزیشك:** لەخـەودا بەڵگەیـــە لەســـەر پێـــشکەوتن‌و ســـەرکەوتن، دەگونجیـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر چـــاکبوونەوە لەنەخۆشـــی، هـەروەها بەڵگەیـە لەسـەر دەرخـستنی کەموکوڕی.
**گوێدرێژ(کەر):** (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: گوێدرێـــژ بـــاپیرەی مرۆڤـــە بەهـــەر چەشـنێك ببینـی ئەگـەر قەڵـەو یـا لاوازبێت.
*ئەگـەر بەباشـی دەڕۆیـشت بـەڕێوە سوودو قازانجی دنیایە.
*ئەگـەر جوانبێـت جـوانی‌و قەشـەنگی خاوەنەکەیەتی.
*ئەگـــەر ســـپیبوو ئـــاین‌و گەشـــەی خاوەنەکەیەتی.
*ئەگەر لاوازبـوو هەژارییـە ، قەڵـەویش مـاڵ‌و دارایـی خاوەنەکەیـەتی، ئەگـەر رەشـبوو شـادی‌و مامەڵـەی خۆشـیەتی لەگـــەڵ موڵـــك‌و دەســـتەڵات‌و فەرمانڕەوایی.
*ئەگـەر رەنگـی سـەوزبوو پارێزکـاری‌و ئاینداریيە.
(ئیبن سیرین) لەنێو سەرجەم ئاژەڵانـدا گوێدرێـــژی لاباشـــتربوو، هـــەروەها گوێدرێـــژی رەشـــیش لەپێـــشتربوو، گوێدرێـــژێ بەزینـــەوە کوڕێکـــە لەشکۆمەندیدایە.
*درێـــژی کلکـــی گوێدرێـــژ مانـــەوەی دەستەڵات‌و پۆستی فەرمانڕەواییە.
*تـــۆپینی گوێدرێـــژ بەڵگەیـــە لەســـەر مردنی خاوەنەکەی.
*سمـــی گوێدرێـــژ سەرچـــاوەی مـــاڵ‌و داراییەکەیەتی.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر گوێدرێژەکەی بتـۆپێ مـاڵ‌و دارایـی لەکیـسدەچێت ئەگـەر وانـەبێت پەیوەنـدی دەبـچڕێ یـاخود خزمەتکارەکـەی دەمرێـت یـا باوك‌و باپیری دەمـرن کەبـەخێویانکردو

رزق‌و رۆزیان بۆ پەیدادەکرد، ئەگەر واش نەبوو گەورەو سەرداری دەمرێت یاخود سەفەر دەکات‌و دەستبەرداری خزمەتکارەکەی دەبێت.

*ئەگەر ژنبێت مێردەکەی تەلاقیدەدات یاخود دەمرێت یان سەفەردەکات.

*ئەو گوێدرێژەی خاوەنەکەی نەناسراوە پیاوێکی نەزان‌و بێباوەڕە بەپێی ئایەتی: ﴿ انَّ أنكَرَ الأصْوَاتِ﴾ (لقمان: ١٩).

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی جوولەکە بەپێی ئایەتی: ﴿ كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أسْفَاراً ﴾ (الجمعة: ٥)، ئەگەر گوێدرێژەکە زەڕانی لەسەر مزگەوتێك یان بڵندگۆیەکەوە بێباوەڕێك بانگەشەی بێباوەڕیدەکات، ئەگەر بانگیدا بەبانگی ئیسلام بێباوەڕێك موسوڵماندەبێت.

*ئەگەر بینی بوە بەخاوەنی گوێدرێژ تووشدەبێت بەدەستی کۆمەڵ‌و گروهێکی نەزانەوە بەپێی ئایەتی: ﴿ كأنهم حُمر مستنفرة﴾ (المدثر:٥٠).

*ئەگەر سواری گوێدرێژێك ببێت‌و بەباشی پێوەی بڕوات باپیرەی لەکاروکردەوەی رازییە.

*ئەگەر گۆشتی گوێدرێژ بخوات ماڵ‌و دارایی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی گوێدرێژەکەی بەلێدان دەڕوات بەڕێوە بێبەشەو بەتەنیا بەنزاو پاڕانەوە نان‌و بژێوی پێدەدرێت.

*ئەگەر گوێدرێژەکەی چوە نێو لانەو ماڵەکەی باپیرەیەتی بەخێرو چاکەوە رووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی گوێدرێژەکەی بوە بەهێستر بژێوی لەلایەن فەرمانڕەواوە دەبێت، ئەگەر بوو بەدڕندە بژێوی لەلایەن ستەمکارێکەوە دەبێت، ئەگەر بوو بەبەرانێك باپیرەیەتی رێزداریدەکات.

*ئەگەر بینی گوێدرێژەکەی هەڵگرتووە هێزو توانایە خودلوەند پێیدەبەخشێ هەتا پێی سەرسامدەبێت.

*ئەگەر گوێی لەسمی ئاژەڵبێت بەبێنەوەی بیبینێ باران‌و رێبازە.

*گوێدرێژ بۆ گەشتیارو موسافیر خێرە لەوەی هێواش بێت‌و نەجووڵێت.

*ئەگەر تەرسی گوێدرێژ کۆبکاتەوە ماڵ‌و دارایی زیاددەکات، ئەگەر زۆرانبازی لەگەڵ گوێدرێژێکدا بکات هەندێك لەخزمە نزیکەکانی دەمرن.

*ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ گوێدرێژێکدا بکات بەهێز دەبێت لەسەر رێبازی باوباپیرانی.

* ئەگەر بینی گوێدرێژێك هاوسەرگیری لەگەڵکردوە ماڵو دارایی‌و جوانی بەئەندازەیەکی بێشومار زیاددەکات.
* گوێدرێژی رام‌و گوێڕایەڵ بێداری باپیرەی خەوبینەرە بۆ خێرو ماڵو دارایی.
* ئەگەر ببیێ بەخاوەن گوێدرێژێك یاخود بیبەستێتەوە یان بیخاتە نێو ماڵی خۆی خوداوەند خێرو چاکەیەکی بێشوماری پێدەبەخشی‌و قوتاریدەکات لەغەم‌و پەژارە.
* ئەگەر لەسەر پشتی گوێدرێژەکەی بکەوێتە خوارەوە هەژار دەکەوێت، ئەگەر گوێدرێژەکە هی کەسێکیتر بێت‌و لەسەری بکەوێتە خوارەوە پەیوەندی نێوان خۆی‌و هاوەڵەکەی دەبچڕێ.
* ئەگەر گوێدرێژێك بکڕیّ‌و نرخەکەی بدات بەدرهەم خێروچاکەی لەقسەوگوفتارەوە دەستدەکەوێت.
* ئەگەر گوێدرێژێکی چاوکوێر ببینیّ ماڵو داراییەکی هەیە شوێن‌و جێی نازانێت، ئەوەی ناقۆڵاو نکوولی لێکراوە لەگوێدرێژدا دەنگییەتی، لەبنەڕەتدا باپیری مرۆڤو بەختیەتی.
*ماکەر ژن یان خزمەتکارێکی بەدخوو یان بازرگانی مرۆڤو شوێنی سوودو قازانجیەتی، ئەگەر لەخەودا لەژێریابوو دووگیانبوو لێی‌و منداڵیبوو بەچەشنیّ ڕەگەزی ئەو قبوڵینەکات کوڕەکە هی ئەو نییە گەرنیشانەیەکی تێدابێت.
* ئەگەر لەشیری ماکەر بخواتەوە نەخۆشییەکی سووك دەگرێت‌و چاکدەبێتەوە.
* ئەگەر ماکەرەکەی جاشەکەرێکی نێرینەیبێت منالی نێرینەی دەبێت ئەگەر مێینەبوو بەڵگەیە لەسەر خاوی‌و لەسەرخۆیی.
* هەروەها دەڵێن: ئەوەی سواری ماکەرێك ببێت بێنەوەی جاشەکەری لەگەڵدابێت ژنێکدەهێنێت بەبێنەوەی منداڵی هەبێت، ئەگەر گوێدرێژەکە جاشەکەری لەگەڵدابێت ژنێکی کوڕدار دەهێنێت.
*ئەگەر بینی دەستی جاشەکەیگرت یاخیبوو ترس‌وبیم ڕووی تێدەکات لەلایەن کوڕەکەیەوە، ئەگەر یاخینەبوو سوودو قازانجێکی هێواشی پێدەگات.
*هەروەها دەڵێن: ماکەر زیادبوونی ماڵو دارایی‌و پلەوپایەیە.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا منالە یا کوڕە یاخود ژنە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەر یان زانست بەپێی ئایەتی: ﴿كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا﴾ (الجمعة: ٥).

* ئەوەی پێچەوانەی حاڵی بەئاگابوونی لەگوێدرێژەکەیدا بەدیبکاتو خەوبینەر لەخواترس بێت بەڵگەیە لەسەر خاوبوونەوەی بەندایەتی.
* دەگێڕنەوە (ذي النون) ی (میسری) (ڕەزای خوای لێبێت) گوتویەتی: من کاتێ سەرپێچی خوداوەند دەکەم ئەو حاڵوبارە لەگوێدرێژو خزمەتکارەکەمدا بەدیدەکەم.
* ئەگەر سواری ئاژەڵێکبوو کەشیاوینەبوو بەهۆی توێشوو پێداویستیەکانەوە ئەرکدەخاتە ئەستۆی یەکێك کەشایستەینەبێت.
* دەگونجێت گوێدرێژ بەڵگەبێت لەیەر بژێویو ڕزقو ڕۆزی.
* گوێدرێژ بەڵگەیە لەسەر:
+زانایەك کارو کردەوە بەزانیارییەکەی نەکات.
+جوولەکە.
+ئەوەی مرۆڤ لەسەری دادەنیشێت.
* هێسترو خاوەنداریتی گوێدرێژ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جوانکاری بەماڵو سامان.
* گوێدرێژ ژنێکی بژێوی پەیداکارەو خێرو بێری زۆرەو وەچەو نەوەی سوودو قازانجی پەیتا پەیتا هەیە.
* دەنگی گوێدرێژ بەڵگەیە لەسەر:
+شەڕو ناخۆشی.
+کوڕو منداڵی زینا.
+دەرکەوتنی جنۆکەو دروستکراوی پەنهان.
* هەروەها دەڵێن: بینینی دەنگی گوێدرێژ بەڵگەیە لەسەر تاریکایی.
* ئەگەر بینی بەباشی دەتوانێت سواری گوێدرێژ بێت یاخود دەترسێ لەوەی سواری ببێت، بەچەشنێکی جیاوازی خۆیدەردەخات.
* ئەگەر زانایەکی بینی سواری گوێدرێژبوە پلەوپایە بەدەستدەهێنێتو لەوانە وتنەوە دوا دەکەوێت.
* گوێدرێژی لەڕولاواز ماڵو دارایی‌و زیادبوونیەتی.
* گوێدرێژی قەڵەویش ماڵو داراییەکە تەواوبوەو کۆتایی هاتوە.
* گوێدرێژی (مەغربیی) باشترین جێنشینە.
* ماکەر ماڵو داراییەکە لەچاندنو کشتوکاڵ بەدەستیدەکەوێت.
* ئەگەر بینی سواری جاشەکەرێکبوە غەمو پەژارە ڕووی تێدەکات لەلایەن کوڕ یان ژنەوە.
* ئەگەر گوێدرێژەکەی بمرێت ماڵو دارایی زیاد دەکات، دابەزینیش لەسەر پشتی گوێدرێژو فرۆشتنی هەژارییە.

*ئەگەر بینی گویدریژێك سەر دەبڕێت تا گۆشتەكەی بخوات و رزق و رۆزی فراواندەبێت لەدوای تەنگەژەو نەداری.
*ئەگـەر بینـی گوێدرێـژ بۆیـەكێكیتر سەردەبڕێت خوارسنی خراپدەبێت.
*ئەگـەر بینـی گوێدرێژەكـەی چـەن كلكێكـی هەیـە بەڵگەیـە لەسـەر رزق و رۆزی فراوان.
*ئەگـەر بینـی گوێدرێـژێك یـا چـەن گوێدرێـژێكی هەیـە خۆشـی و شـادی و خێروچاكەی زیاددەكات.
*گوێدرێـژی كێـویش بەڵگەیـە لەسـەر سەرپێچی.
*ئەگـەر بینـی سـواری گوێدرێـژێكی كێوی بوەو لەسـەر پشتی دەكەوێتە خوارەوە بائاگاداری سەرپێچی بێت.

**گوێدرێژەوان ( خاوەن گوێدرێژ )**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: خاوەن مـاڵی حەرامـەو سەرچاوەی بژێوی نادروستو حەرامـەو هـــانی خەڵكیـــدەدات لەســـەر بەتاڵ و ناڕەوا.
(نابلـسی)دەڵێـت: خـاوەنی گوێدرێـژ بەڵگەیـە لەسـەر بەرپرسـی كاروبـار، بینینی بەڵگەیە لەسەر بژێوی بـەهۆی سـەفەرو گەڕانـــەوە، دەگونجێـــت بەڵگەبێت لەسەر سووك و ئاسانكردنی كاروباری قورس و گران.

**گوێدرێـژی كێـوی**:(ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: جیـاوازی هەیـە سـەبارەت بەگوێدرێـژی كێـوی لەلێكدانـەوەدا، هەنـدێكیان دەڵـێن: پیاوێكـە، ئـەوەی ببینـێ بەڵگەیـە لەسـەر دوژمنایـەتی نێـوان خەوبینـەرو كەسـێكی نادیـار كەهیچ و پووچ و بەدڕەچەڵەكە.
*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر ماڵ و دارایـی، ئـەوەی ببینـێ گوێدرێـژێكی كێوی لەدوورەوە ئەوە ماڵ و داراییەكی تیاچووی دەستدەكەوێتەوە.
*دەڵـێن: سـواربوونی گەڕانەوەیـە بـۆ ناحـەقی و بـەتاڵ و تێكـدانی بەنـدی گوێڕایەڵی بۆ موسوڵمانان.
*ئەگـەر گۆشـتی گوێدرێـژێكی كێـوی خـــوارد یـــان شـــیرەكەی چـــەند خزمەتكارێكی دەستدەكەوێت لەلایـەن پیاوێكی رێزدارەوە.
*شـیری گوێدرێـژی كێـویش مـاڵ و داراییەكەی رامكراوە.
*ئەگـەر سـواری گوێدرێـژێكی كێوییـوو رام و گونجـاوبوو بـۆی سـەریكردوەتە سەرپێچی، ئەگەر گوێدرێژەكە رامنەبوو زۆرانبازیـــدەكات لەگـــەڵی یـــاخود لێیدەدات ناڕەحەتی قورسـی پێدەگات بـەهۆی سەرپێچییەوەو غـەم و پـەژارە رووی تێدەكات.

* ئەگەر گوێدرێژەکە چوە ماڵەکەی پیاوێکی بەدوخراپی بێدین روودەکاتە ماڵەکەی، ئەگەر گوێدرێژەکەی بردە نێو ماڵەوەو لەدڵو دەروونـدا وەك نێچیرێك بۆیدەڕوانی خێرو دەستکەوت روو لەماڵەکەیدەکات.

* ماکەری کێوی ژنە، خواردنی شیرەکەی خواناسیو ڕێنوماییە لەئاییندا.

* ئەگەر بینی بوە بەخاوەنی گوێدرێژی کێویو رام ببێت بۆی قسەی بەسەر کۆمەڵو تاقمێکی پەرتەوازەی موسوڵماناندا دەڕوات.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر گوێدرێژی ئاسایبوو بەگوێدرێژی کێوی بەڵگەیە لەسەر زیان بۆی، ئەگەر گوێدرێژەکەی یەك کەڵەچاوبوو یا دییەی لاوازبوو کەمو کوڕی روودەکاتە بژێوی.

* ئەگەر بینی بوە بەگوێدرێژ بەلاو نەهامەتیەك رووی تێدەکات ئەقڵو ژیری تێکدەداتو کردارەکانی کەم خێر دەبێت.

* ئەگەر گوێدرێژێکی بینی لەئاسمانەوە دابەزیوەتە خوارەوەو عەورەتی چوە بەنێو پاشیدا ماڵو دارایی بێشوماری دەستگیردەبێتو پێی دەوڵەمەنددەبێ بەتایبەت ئەگەر پادشاو فەرمانڕەوابوو.

* هەروەها گوێدرێژی کێوی بەڵگەیە لەسەر:

+هاوسەر یاخود منداڵ.

+کەسانی دڵڕەقو توندوتیژ.

+کەسانی دەشتەکیو گوندنشین.

* هەروەها مانگای کێویش وایە بەلاّم پتر بەسۆزە لەگوێدرێژی کێوی.

**گوێرەکە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کوڕێکی نێرینەیە ئەگەر بەشاخەوەبوو یان پێیبەخشرا، هەموو بەچکەیەکی ئاژەڵانی تریش هەر بەوشێوەیە ئەگەر پێی ببەخشرێ.

* گوێرەکەی سورەوەکراو دڵنیاییە لەترسوبیم بەپێی چیرۆکەکەی حەزرەتی (ئیبراهیم) (سەلامی خوای لێبێت).

* گوێرەکە کوڕێکە شایستەی خێرە، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو سەرپێچیو دەرچوون لەگوێڕایەڵی خوداوەند.

* ئەگەر ژنێك بینی بەخشڵی زێڕەوە یان بەجلوبەرگەوە بەڵگەیە لەسەر خۆشیو شادی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر فیتنە.

* گوێرەکەی قەڵەو مژدەیە بەبوونی کوڕو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا .

* ئەگەر بینی گۆشتی گوێرەکە دەخوات ماڵو دارایی لەپیاووژن بەدەستدەهێنێ، ئەگەر بینی گوێرەکەیەکی هەڵگرتو بردی بۆ ماڵی خۆیان غەمو پەژارەیەکی قووڵ رووی تێدەکات.

**گوێز:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گوێزی هندی: نێرگەلەیە، هەندێکدەڵێن: ماڵو داراییەکە لەلای پیاوێکی فالگەری بەئەستێرە، ئەگەربینی گوێزی هندی دەخوات زانیاری ئەستێرەگەری فێردەبێت یاخود دوای رای ئەستێرەگەرێك دەکەوێت لەراوبۆچووونداو بڕوای پێدەکات، هەروەها ئەگەر بینی بوە بەکاهین یاخود ئەستێرەگەر بەبێداریو بەئاگایی گوێزی هندی بەدەستدەهێنێت.

(نابلسی)دەڵێت: ماڵو داراییەکی پەسمەندەکراوە، ئەگەر خشەخشی هەبوو ناکۆکیو دەنگەدەنگو قاووقیژە.

* دارگوێز پیاوێکی عەجەمی رەزیلو چرووکو وەرەوکارەو خاوەن ماڵو داراییەکی کتوپڕەو خێری لێناکات.

* ئەگەربینی لەسەر داگوێزێکە وابەستەی پیاوێکی عەجەمی گەورە دەبێت بەپێی پیاهەڵدانی خۆی.

* ئەگەر لەسەر دارگوێزەکە هاتەخوارەوە نێوانیان یەکناگریو نابەستریّ، ئەگەر کەوتەخوارەوە لەسەریو مرد لەبەردەم پیاوێکی کەتەوڵی لەشولار گەورەدا دەکوژرێت یان لەبەردەم پادشایەك، ئەگەر درەختەکە شکا پیاوە لەشولارگەورەکە دەمرێتو ئەوەی دەکەوێتەخوارەوە دەبێت بەفەرمانڕەوا ئەگەر نەمرێت قوتاردەبێت، ئەگەر هەردوودەستو قاچی شکا روو بەتیاچوونو هیلاکی دەچێتو بەلاو نەهامەتیەکی گەورە رووی تێدەکات بەڵام لەدواییدا قوتاردەبێت.

* ئەگەربینی دارگوێزێك دەبڕێتەوە پیاوێکی عەجەمی دەکوژێت.

* ئەگەر گوێزی لەباخێك لێکردەوە لەماڵو دارایی لەلای ژنێکەوە بەدەستدەکەوێت ئەگەر گوێزەکە پاککرابوو رزقو رۆزی تەواوە.

* ئەگەر توێکڵی گوێزی خوارد غەیبەتی پیاوێکی رەزیلو چرووکدەکات، ئەگەر ئەو توێکڵە ژنێك بلاویکردەوە غەیبەتی پیاوێکی رەزیلو چرووك دەکات.

* ئەگەربینی وەك ئەوەی یاری بەگوێزدەکات لەماڵی حەرامدا رۆدەچێت.

*گــوێزی پــاککراویش رزق و رۆزییــه، هــهروهها دهچــوێنرێ بهپیاوچــاکان و سهرکردهو برایان.
*هــهروهها دهچــوێنرێ بهلهشــساغی و درێژهکێشانی سهفهر.
*ئهگهرخهوبینهر ژنبــوو گــوێز بهڵگهیــه لهســـهر تهمهندرێــژی لهگـــهڵ مێــردو هاوســـــهر بـــــهۆی واژووبــــــوونی پیتهکانیـــهوهو دروســــتی کاروبـــاری قورس و گران و ئهستهم.
*گـــــوێزی شـــــکاو ماڵودارایيـــــه بهبێماندوبوون.
*گوێزی هندی بهڵگهیه لهسهر گوفتاری کاهینهکان، ئهگـهربیبنی گـوێز دهخـوات گوتهی راست و دروستدهبێت.
**گـوێگر**:(نابلـسی) دهڵێـت: گـوێگرتن لهقورئان یان گـوێگرتن بـۆ پیاههڵدانی پێغهمبـهر (ﷺ) یـان گـوێگرتن لـهوتار بهڵگهیه لهسهر رێنومای و گهڕانـهوه بـۆ لای خــوداو پاشــگهزبوونهوه، ئهگـــهر گوێبیـستی بـهدهر لـهوه بـوو ئـهوه دهچـــێتهریزی ئهوانـــهی خوداوهنـــد دهربارهیـــان دهفـــهرموێت: ﴿ وَإِنْ تَـدْعُوهُمْ إِلَى الْهُـدَى لاَ يَـسْمَعُوا﴾ (الأعــراف: ١٩٨). گــوێگرتنیش درۆو فیتنهیه، دهگونجێت گوێگر ناڕهحهتی و بهڵاو نههامهتیهك بێته رێی.

*ئهگـــهر بینـــی گوێـــدهگرێ ئهگـــهر بازرگـــــــانبوو گرێبهســـــــتهکهی ههڵدهوهشێنێ، ئهگـهر فـهرمانڕهوابێت لادهبرێت.
*ئهگهر بینینی گوێی لهمرۆڤێك گرتـوه بهنهێنی دهیهوێت ئابڕووی ببات.
*ئهگهر بینی گوێی لهوتی وتی گرتـوهو شوێنی باشترین وته دهکـهوێت مـژدهی پێدهدرێت.
*ئهگـــهر بینـــی گوێـــدهگرێ و خـــۆی بهچهشنێك لێدهکات و گـوێی لێنییـه ئهوه درۆدهکات و رادێت لهسـهرئهوهی، هـــهروهها گوێبیـــستبوونی دهنگـــهکان لهخهودا یاخود پێدانی ئـهوهی شیاوی خهوبینهره بهم چهشنهیه:
+ **قاووقیژی نـهوهی (ئـادهم)**: رزق و رۆزی و سوودو قازانجه.
+ **دهنگی ئاژهڵ**: غهم و پهژارهو تـرس و بیمه.
+ **ســهگوهڕ**: گوتــهو خۆههڵقورتانــه لهکارێکدا هیچ کهڵکناگرێ.
+ **مرهی پڵنگ**: خۆنواندن و نـازکردن و پێنهزانینه.
+ **گمـهگمی کـۆتر**: شـیوهن یـاخود مارهبڕینه.

+**دەنگی پەڕەسێلکە:** قسەو وتەی بەسوودە یاخود گوێگرتنە لەقورئانی پیرۆز.

+**دەنگی بۆق:** لێدانە یان دەنگی زەنگە.

+**فیشکەی مار:** جەنگاندن و ئاگاداری و دەمەدەمەیە.

+**زەڕەی گوێدرێژ:** دوعاکردنە لەستەمکاران.

+**ڕەزیل، بەخیل:** گوتەو خۆخستنە نێو گومانەوەیە.

+**بۆڕەی گوێرەکە:** فیتنەو ئاشوبە.

+**دەنگی حوشتر:** سەفەرەو ماندوبوونە.

+**نەڕەی شێر:** هەڕەشەلێکردنە.

+**مەرەی پشیلە:** فیتنەی و دەنگەدەنگە لەگەڵ چاوداگرتن و فرۆفێڵ.

+**دەنگی مشك:** کۆبوونەوەو خۆشەویستی و رزق و ڕۆزییە.

+**دەنگی ئاسك:** ئالوودەو بیرکردنی نیشتمانە.

+**لورەی گورگ:** ئاگاداری دزییە.

+**دەنگی ڕێوی:** ئاگادارییە بەهەڵهاتن و گواستنەوە.

+**دەنگی چەقەڵ:** کاروباری گرنگە لەشەڕو چاکەدا.

*__گوێگرانی مرۆڤ:__ (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر سەرسامی و جیاوازی و پەرتەوازەی یان درۆکردن لەگەڵی.

**گوێهەڵخستن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گوێ هەڵخستن لەخەودا بریتییە لەدرۆو قسەهەڵبەستن، بەپێی فەرمایشتی خوداوەند ﴿يُلْقُونَ السَمْعَ وَأَكْثَرُهُم كَاذِبُون﴾(الشعراء: ٢٢٣).

واپێویست دەکات گوێ هەڵخستن لەلایەن فەرمانڕەواوە کارێکی ناشیاوو گونجاو بێت بەپێی ئایەتی ﴿إِلاَّ مَنْ إِسْتَرَقَ السَمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُبِين﴾(الحجر:١٨).

*سەبارەت بەگوێهەڵخستن : ئەوەی لەخەودا ببینێ گوێی هەڵخستوە ئەگەر بازرگانبوو پەشیمان دەبێتەوە لەگرێبەست و پەیمان، ئەگەر فەرمانڕەوا بێت لەکاردەخرێ بەپێی ئایەتی: ﴿إِنَّهُم عَنِ السَمْعِ لَمَعْزُولُون﴾(الشعراء:٢١٢).

*ئەگەر خۆی بینی گوێی گرتوە لەیەکێك دەیەوێت ئابرووی ببات و نهێنی ئاشکرا بکات.

*ئەوەی ببینێ گوێ بۆ وتی وتی و قسەی ئەم و ئەو رادێری و شوێنی باشەکانی دەکەوێت مژدەی پێدەدرێت بەپێی ئایەتی : ﴿فَبَشِر عِبَاد ، الذين

يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ ﴾(الزمر: ١٧ـ ١٩).

* ئەگەر بینی گوێی هەڵخستبوو بەلام خۆی وانیشاندەدا گوێی لێنییە راستناکاتو بەر ئایەتی: ﴿يَسْمَعُ آيَاتِ اللهِ تُتْلَى عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِراً كَأَنْ لَمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ (الجاثية: ٨)

گ وو

گووژاڵك (كوژاك): (ئیبن سیرین)دەڵێت: داری گوژاڵك پیاوێکی ترسنۆکی تۆقیوی بێدینەو خوای گەورە بەپیسو گەندەڵ ناوزەدیکردوەو بەچەشنێ باسیدەکات جێگیربوونی نییەو دەفەرموێت: ﴿كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِنْ فَوْقِ الأَرْضِ مَالَهَا مِنْ قَرَارٍ﴾ (ابراهيم: ٢٦) بەروبوومەکەشی غەمو پەژارەیە.

گ ۆ

گۆچان (گالۆك): (ئیبن سیرین) دەڵێت: گۆچان کوڕێکی خێراو تیژتێپەڕە، هەروەها دەڵێن: پیاوێکی دووڕووی شەلەو یاریکردن پێی هانابردنە بۆ پیاوێك ئەوە سیفەتی بێت.

* هەروەها دەڵێن: باش نییە لەخەودا بەپێی ئایەتی: ﴿أَفَأَمِنُوا أَنْ تَأْتِيَهُمْ غَاشِيَةٌ مِنْ عَذَابِ اللهِ﴾ (يوسف:١٠٧).

(نابلسی) دەڵێت: گۆچان زمانێتی یاری پێدەکات ویستو خواز لێکدەدرێتەوە، ئەوەی تێدا روودەدات لەزیادوکەم بیگەڕێنەوە بۆ کوڕ یا زوبان.

* ئەگەر بینی بەگۆچان لەتۆپێکدەدات شەڕ لەگەڵ هاوسەرەکەی دەکات یان لەگەڵ پیاوێکی دووڕوو چونکە تۆپ هەرکات بوەستێ دیسان ماندوویدەکاتو لێیدەداتەوە، ئەمەش لەشەڕو پێکداداندەچێت.

* وشەی گۆچان لەوشەی(جان)ەوە هاتوە دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر جەنگو زوبان.

* هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر خێرێکی گوزەراو لەرابردوودا.

* ئەگەر بینی گۆچانێکی بەدەستەوەیەو لێدەدات خوازەکانی دەستگیردەبێت بەبێئەوەی جێگیر بوو بێتو بەئەندازەی زاڵبوونی بەسەر لێداندا بەدەستیدەهێنێت.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: گۆچان پیاوێکی پارێزراوی دووڕوە، ئەگەر بینی گۆچانێکی بەدەستەوەیە پەنادەگرێ بەپیاوێك ئەو سیفەتەی هەڵگرتوەو ئەوەی کەوا خوازیاریەتی

بەدەستیدەهێنێتو بەسەر دوژمناندا زاڵدەبێو ماڵو دارایی زیاد دەكات.

*ئەگەر گۆچانەكەی بەنوشتاوەیی بینیو خۆیدابوو بەسەریا ماڵو سامانی دەڕواتو ئەوەش لەخەڵكی وندەبێ، ئەگەر بینی شكا ئەگەر بازرگانبوو بازرگانیەكەی زەرەدەكات، ئەگەر فەرمانڕەوابوو لادەبرێت.

*ئەگەر بینی بەگۆچانەكەی كێشای بەزەویەكدا كێشەو گرفتی تێدابوو دەبێت بەخاوەنی ئەو زەوییەو نەیارەكانی دەشكێنێ.

*ئەگەر بینی خۆییەوە بەگۆچان بەخێرایی‌و كتوپڕ دەمرێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی گۆچانەكەی شكا نەخۆشیەكی سەختو توندەدەگرێو هێزو توانای لەبەردەبرێت.

*ئەگەر بینی بەگۆچانەوە دەڕوات بەڕێوە سوورە لەسەر سواربوونی كەشتی.

*گۆچان بەڵگەیە لەسەر:

+فەرمان بەچاكەو ڕێگری لەخراپە.

+سەركەوتن بەسەر دوژمناندا.

+گەیشتن بەهیواو ئاوات.

*ئەگەر گۆچانەكە لەبادەمبوو بەڵگەیە لەسەر بەسەرچوونی ئەوەی خێروشەڕی تێدایە.

*ئەگەر لەقۆخبوو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دووڕوویی لەئایندا.

*دەگونجێت گۆچان بەڵگەبێت لەسەر مار یان جادوو.

*ئەگەر بینی لەكەسێكدەدات بەگۆچان زماندرێژیدەكات بەسەریا.

*ئەگەر گۆچانەكەی كێشا بەبەردێكدا ئاوی لێدەرهێنا ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەنددەبێت، ئەگەر دەوڵەمەندبوو پتر دەوڵەمەند دەبێ، دەگونجێت رزقو رۆزییەكی باشبێت.

*دەگونجێت گۆچان پیاوێكی گەندەڵو پیسو بێ ئاین بێت چونكە لەدار دروستكراوەو ئەوەش پیاوێكی دووڕووە.

**گۆرانی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر گۆرانیەكە خۆشبوو بەڵگەیە لەسەر بازرگانیەكی بەسوود ، ئەگەر باشنەبوو بەڵگەیە لەسەر بازرگانیەكی زەرەرمەند.

*هەندێكدەڵێن: گۆرانیبێژ زاناو دانایە یان یادخەرەوەیە.

*گۆرانی لەبازاڕدا ئابڕوچوونە یاخود کاروباری ناقۆلایە دەکەونە نێوی، بۆ هەژاریش ژیری‌و ئەقڵ لەدەستدانە.
*ئەگەر شوێنێکی بینی گۆرانی تیا دەگوت لەوشوێنەدا درۆ روودەدات‌و جیاوازی دەکەوێتەوە نێوان خۆشەویستان‌و پلانی ئیرەییبەرە.
*هەروەها دەڵێن: گۆرانی بەڵگەیە لەسەر قاووقیژو گێرمەوکێشمە بەهۆی جیاوازی جموجووڵی سەماوە.
*ئەگەر بینی هۆنراوەیکردوە بەگۆرانی بەدەنگێکی خۆش‌و بەرز خێرە بۆ گۆرانیبێژان‌و سەرجەم ئەوانەی لەوان.
*ئەگەر بینی گۆرانییەکی ناخۆشی وت بەڵگەیە لەسەر بێکاریی‌و رسوایی.
*ئەگەر بینی لەنێو قوڕدا دەڕوات‌و گۆرانی دەڵێت: خێرە بەتایبەت ئەگەر خورمای فرۆشت.
*گۆرانیبێژی حەمام قسەو وتەی تاوانبارە.
*هەروەها دەڵێن: گۆرانی لەبنەڕەتدا بەڵگەیە لەسەر شەڕو ئاژاوەو دەنگەدەنگە.
*گۆرانی‌و لاواندنەوە بەلاونەهامەتییە.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەحەمامدا گۆرانی وت لەبازاڕدا بەخواناس ناسرابوو ئامادەی فیتنەدەبێ کەروودەدات‌و دەکەوێتەوە.
*گۆرانی ملکەچ‌و رسوایان لەبازاڕدا بەڵگەیە لەسەر ئەقڵ‌و سووکیان.

**گۆرانیبێژ:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودات بینینی بەڵگەیە لەسەر شادی‌و خۆشی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەرو گواستنەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر. دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئامۆژگاریکار.

**گـۆرەویی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گۆرەویی ماڵ‌وداراییی‌و پارێزەرە بۆی، ئەگەر بۆنیخۆشبوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی خاوەنەکەی ماڵ‌و داراییەکەی دەپارێزێ بەزەکات‌و بەباشی باسدەکرێ، ئەگەر بۆنەکەی ناخۆشبوو بەڵگەیەلەسەر ناقۆلایی ژن، ئەگەر پروکاوکونبوو بەڵگەیە لەسەر رێگری لەزەکات‌و خێر.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی گۆرەویی لەپێدەکات ماڵ‌و داراییەکەی هاوسەنگ دەبێت ئەگەر دایکی مابوو کۆچی پێدەکات، وەگەرنا کوڕەکەی یاساغدەبێت.
*هەروەها گۆرەویی بەخزمەتکارو ژن‌و بەردەست ناوزەدکراوە.

**گۆڕ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گۆڕی هەڵکەنراو زیندانە هەروەك چۆن زیندانیش گۆڕە.

* ئەگەر بینی دەچێت بۆسەردانی گۆڕستان سەردانی زینداندەکات.

* ئەگەر بینی گۆڕێك هەڵدەکەنێ لەسەربانێك تەمەندرێژ دەبێ.

* کۆمەڵە گۆڕێکی زۆر لەشوێنێکی نادیاردا بەڵگەیە لەسەر پیاوانی دووڕوو.

* ئەگەر بینی گۆڕستان بارانی لێباری خەڵکی سۆزو بەزەییان بەسەرادەبارێ.

* ئەگەر گۆڕێکی لەشوێنێکی نادیار بینی تێکەڵ بەپیاوێکی دووڕوو دەبێت.

* گۆڕستانی ناسراو بەڵگەیە لەسەر کارێکی حەق کەئەو لێی بێئاگایە.

* ئەگەر بینی گۆڕ بۆ خۆی هەڵدەکەنێ لانەوماڵێك بۆ خۆی دروستدەکات.

* ئەگەر بینی گۆڕی مردوویەك گوێزراوەتەوە بۆ ماڵەکەی یان گەڕەك و شارەکەی منداڵەکانی لەو شوێنەدا ماڵێك دروستدەکەن.

* ئەگەر بینی چوە نێو گۆڕێك بەبێئەوەی تەرمو جەنازەبێ ماڵێکی بەتاڵدەکڕێ.

* ئەگەر بینی لەسەر لێواری گۆڕێك وەستاوە گوناهێك ئەنجامدەدات بەپێی ئایەتی: ﴿وَلاَ تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ﴾ (التوبة: ٨٤).

* ئەگەر پیاوێکی دەوڵەمەندی لەگۆڕستان بینی بەدەوری گۆڕەکاندا دەهات و دەچوو سەلامی لێدەکات، هەروەها دەڵێن: بێپارە دەبێ و دەست لەخەڵکی پاندەکاتەوە چونکە گۆڕستان شوێنی بێپارەیانە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا زیندانەو زیندانیش گۆڕستانە، ئەگەر بینی لەگۆڕستان نیشتەجێبوەو هێشتا هەر زیندوە زیندانی دەکرێ.

* ئەگەر گۆڕی هەڵکەندو ڕەبەنبوو ژنێکدەهێنێ بەفرۆفێڵ.

* ئەگەر گۆڕێکی لەسەر زەوی هەڵکەندو دیواری نەبوو لانەی قیامەتە ئەگەر چوە نێوی ئەجەلی هاتوە، ئەگەر نەچوە نێوی هیچی تێدا نییە.

* ئەگەر گۆڕێکی کڕی و نەچوەنێوی ژنێکدەهێنێ.

* ئەگەر گۆڕێکی کڕی و نەچوە نێوی ژنێکدەهێنێ.

* ئەگەر گۆڕێکی بینی لەشوێنێکەوە گوێزرایەوە بۆ شوێنێکیتر کەسێك لەجێنشینەکانی خاوەنی ئەو گۆڕە لانەو ماڵێك دروستدەکات.

*گۆڕی نادیار نەتەوەو کۆمەڵێکی دووڕوون بەپێی ئایەتی: ﴿ وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ ﴾ (فاطر: ٢٢).
*ئەگەر گۆڕێکی هەڵکەند هاوسەردەگرێ، ئەگەر کردی بەماڵی خۆی زۆر باسی مردندەکات.
*گۆڕ بەڵگەیە لەسەر سەفەری دووروو بێزاریو هاوسەرو زیندان.
*ئەگەر بینی گۆڕێك پڕدەکاتەوە تەمەنیدرێژدەبێو لەشساغدەبێ.
*ئەگەر بینی لەگۆڕێکدا ئەسپەردەکرا بەبێئەوەی بمرێ غەمو پەژارە رووی تێدەکات یاخود تەنگەشەو گرفت دێت بەسەریا یاخود زیندانیدەکرێ.
*ئەگەر خۆی بەکفنکراویو ئەسپەردەکراوی بینی لەگۆڕەکەیداو زیندوبوو ژندەهێنێ.
*ئەگەر گۆڕی مردوویەکی هەڵدایەوە خوازیاری رێگەیەکەو شوێنی رێبازی مردوەکە دەکەوێ، ئەگەر مردوەکە زانابێت زانیارییەو بەدەستیدەهێنێت، ئەگەر دەوڵەمەندبوو ماڵو سامان بەدەستدەهێنێ، ئەگەر چووەنێو گۆڕەکەیو بەزیندوێتی بەدیکرد ماڵو دارییە حەرامە، ئەو زانیاریو داناییە راستە، ئەگەر بەمردوویی بینی داواکەی دەستگیرنابێ.
*ئەگەر بینی گۆڕی پێغەمبەری (ﷺ) هەڵدایەوە سوننەتی ئەو زیندودەکاتەوە.
*ئەگەر مردووی بینی لەگۆڕەکانیاندا هەستاونو گەڕانەوە بۆ ماڵیان بەبێئەوەی کەس بیانناسێتەوە لەمزگەوت دێتەدەرەوەو جێنشینانی شار گەرچی هاوەڵپەیداکارن پارێزراو دەبن، یاخود کشتوکاڵی خەڵکی سەوزدەبێت کەپێشتر ناهومێدبوون لێی.
*ئەگەر گۆڕی بێباوەڕێکی هەڵدایەوە یا بیدعەکارێ یان کەسێکی ناموسوڵمان دوای رێبازی سەرگەردانی دەکەوێت یاخود ماڵو دارایییەکی بەحەرامو فروفێڵ چارەسەردەکات، ئەگەر هەڵکەندنەکە بەردەوامبوو هەتا گەیشت بەکەلاکێکی بۆگەن یاخود سووتاو پیساییەکی زۆرو بێشومار ئەوجا لەبەڵگەهێنانەوەدا بەهێزدەبێو دەگات بەدەرەنجامی خراپی خۆی.
**گۆڕستان:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:
+ئامۆژگاری.
+خوێندنەوە.
+گریان.

گیرفـان دڕانـدن بەڵگەیـە لەسـەر ئـەو حاڵوبارانـە، ئەگـەر گریـان لەترسـی خودابـوو یـان بـەهۆی کاریگـەربوون بەئایەتەکانی قورئان یاخود پەشیمان بوونـەوە لـەگوناهو تـاوانی رابـردوو بەڵگەیـە لەسـەر خۆشـیو شـادیو ڕەواندنەوەی خەمو پـەژارەو بەڵگەشـە لەسـەر بارانبـارین بۆئـەوەی بـارانی لێگیراوەو پێویستی پێیەتی.

**گـرێوپێچ**:(ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: گرێوپێچ لەمێزەرو پەتدا سەفەرە.

**گرێـی شتێك**:(ئـیبن سـیرین) دەڵێت: گرێـی کـراس بەسـتنی گرێبەسـتی بازرگانییە.

*گرێـی پـەتێك باشـی ئاینـەو هـی دەستەسڕ بەدەستهێنانی خزمـەتکارەو هی شەرواڵ هاوسەرگیرییە.

*گرێـی دەزوویـەك بەسـتنی کارێکـە کەتێدایە لەدەسـتەلاتو هاوسـەرگیریو بازرگانی.

*ئەگـەر گرێـی بەسـت ئـەوە داواکـەی ئاساندەبێ، بەڵام ئەگـەر گرێینەبەست داواکـــەی قـــورسو ئەســـتەمو مەحاڵدەبێت.

*ئەگەر بینی گرێیەك لەشتێك درا بەبێ ئـەوەی تونـدی بکـات بەڵگەیـە لەسـەر غەمو پەژارە لەیـەن دەستەلاتدارەوە، ئەگەر بینی کەسێکیتر گرێکەی کردەوە ئەوکەسـەیتر هۆکـاری قوتـاربوون ڕزگاربوونیـەتی، ئەگـەر بینـی دوای مانـدوبوونو هـەوڵێکی زۆر کردیـەوە بەقورسـیو ئەسـتەم قوتـار دەبێـت، ئەگەر خۆی کرایەوە خوداوەند دەرووی خێری لێدەکاتەوە لەلایەکـەوە هەسـتی پێنەکردووە.

(نابلسی) دەڵێـت: دەگونجێـت گرێکـان پەیمانو بەڵێنبێت بۆ یەکێك.

## گ ڕ

**گڕوبڵێسە**:(نابلسی) دەڵێـت: لەخـەودا قـسەی ناقۆڵایـە ، ئەگـەر گڕوبڵێسەی بینی قسەوگوتەیەکی خـراپ دەبیـستێ لـەپیاوێکی دەسـتەلاتدارەوە، ئەگـەر بڵێسەی سەند ئەو قسەو گوتەیە زیـاد دەکات.

*ئەگـە ئـەو گڕوبڵێـسەیە دوکـەڵی پەیداکرد ئەوکارە زۆرمەزنترە.

*گڕوبڵێـسە مەترسـییە لەهەرلایـەك لابدات ئەگـەر گڕوبڵێسەکە سـووتاندی بەکزی دوژمنەکەی قسەی خراپـدەکات بەرانبـەریو ئارامـدەگرێ لەسـەریو دوژمنەکـــەی هێوردەکاتـــەوە، یەکگڕوبڵێسە وشەیەکی خراپە.

*ئەگـەر بینینـی گڕوبڵێـسە زۆربـوو لەسەری سزایەك دێت بەسەریا.

*ئەگــەر بینـــی گرویلێـــسە لـــەنێو کۆمەڵێکدا بلاّوبوەوە دوژمنایەتی‌و ڕق‌و قیندەکەوێتەوە لەنێوانیاندا.

*ئەگەر بینی گرویلێسە هەموو شتێکی ســووتاند قــسەو شــەڕو بەربــەرەکانی‌و جەنگە لـەنێوان نەتەوەیەکداو ستەمە بۆیان.

*هــەروەها گرویلێسە بەڵگەیـە لەســەر کــوڕان ، ئەگــەر ســووتاندی یــاخود کەوتەســەر رووخــسار شــەڕو خراپــەی یەك لەدوای یەکە.

*دەگونجێـــت گرویلێـــسە بەڵگـــەبێت لەسەر بەدی‌و خراپی کردەوەکان.

## گ ژ

**گژنیژ:** (ئیبن سـیرین) پیـاوێکی سـوود وەرگـرە لـەئاین‌و دنیـا، گژنیـژی وشـك مـــاڵ‌و ســـامانێکە مـــاڵ‌و دارایـــی بێچارەسەر دەکرێ.

**گژوگیای ئەسپەك:** (نابلـسی)دەڵێـت: لەخـــەودا بەڵگەیـــە لەســـەر خۆشـــی‌و شادی‌و نزیکبوونەوەی ڕزق‌و ڕۆزی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسـەر هـەواڵی خۆش یان مرۆڤی نامۆ بەهـەمان شێوە ئەوەی لـەمیوەو گـوڵی بۆنـداری سـەیر دەچێت لەلێکدانەوەدا بەو شێوەیەیە.

## گ س

**گـسك:** (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: گـسك خزمەتکارە .

(نابلسی)دەڵێت : ئەگـەر زبـرو ڕەقبـوو خزمــەتکاری سەرپێــچیکارە ، گــسکی نەرمیش خزمەتکاری خزمەتکارەکانە.

*هەروەها گسك بەڵگەیە لەسەر کچ.

*ئەگــەربینی ماڵەکــەی گــسك دەدات ئەگــــەر دەوڵەمەنـــدبوو ترســـــی هەژارکەوتنی هەیە.

*هــەروەها وتــراوە: گــسکدانی مــاڵ بەڵگەیـە لەسـەر مردنـی خۆشـی یـان چـوون روو بەکەسـێکیتر یـاخود مـاڵ‌و سامانی پەرش‌و بلاّودەبێتەوە.

*ئگـەر زەوییـەکی گـسکداو زبڵـەکانی کۆکردەوە سـوود لەماڵ‌وسـامانی گونـد وەردەگـرێ ئەگـەر هـەیبێت، وەگـەرنا جـابی‌و هـــەژارێکی دەرودووکـــردوو دەبێ.

*دەگونجێت بینینـی گـسك بەڵگـەبێت لەسـەر ڕەواندنـەوەی غـەم‌و پـەژارەو قەرزدانەوە.

**گـسکدان:** (نابلـسی) دەڵێـت: بۆیـەکێك کاری پیس‌و پۆخڵ ئەنجامبدات بەڵگەی خێرە بەتایبەت بۆ پیشەوەران.

*ئەگـەر مـاڵی کەسـێکی تـری گـسکدا ماڵ‌و سامان بەدەستدەهێنێ، گـسکدان

بۆ دەوڵەمەند هەژاریی و کەمکردنی ماڵ و سامانە.

## گ ل

**گلکار:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گلکێش پیاوێکە ئابرووی خەڵکی دادەپۆشێ، ئەگەر بینی کارێك لەقوڕ دروستدەکات کردارێکی چاك و باش ئەنجامدەدات.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی گلکار بەڵگەیە لەسەر توندوتیژی لەکاروبارداو ئەوەی خۆی لەبەرژەوەندی و کاری کەسێکیتردا ماندودەکات.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر غەم و پەژارە.

**گڵ و قوڕکار:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر قوڕکاری بینی لەخەودا بەڵگەیەلەسەر غەم و پەژارەو گواستنەوەی قسەوباس، ئەگەر لەخەودا گڵی گواستەوە بەڵگەیە لەسەر ڕەواندنەوەی غەم و پەژارە لەهاوەڵەکانی.

**گلۆڵەی خوری:** (نابلسی) دەڵێت: بۆ بژێویداران بەڵگەی سوودو قازانج و رزق و رۆزییە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کرێگرتەی کار بەردەوام و مندالّ یان تەمەنیدرێژ.

**گلێنەفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە خەریکی قاپ و قاچاغ دروستکردنەو خزمەتکارە یاخود ژنی بەدین و بەرزە.

*شتومەکی گلکاری بەڵگەیە لەسەر شانازیکردن بەپەچەڵەك و ماڵ و سامان و جوانییەوە.

**گلێنەی سورەوەکراو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گلێنە لەخەودا پیاوێکە خێروچاکەی بۆ دەرودراوسێکانی دەبێت.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی گلێنە بەڵگەیە لەسەر ژن و دەمەوانەو دەسکەکەشی ماڵ و جیهازییەتی لەگەڵ منالّ ئەگەر مسبوو، ئەگەر لەشووشەبوو بەڵگەیە لەسەر ژنی هەژار یاخود بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی کاروبارو شاراوەو نهێنی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژنێك زوو دووگیان بێت و زوو منالّی لەباربچێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کچ و ئاژەڵ یان سەفەر.

## گ و

**گوارە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گوارە بۆ پیاوان ئەنجامدانی کارێکە بەگوێ.

*ئەگەر ژنێك یان کچێکی بینی گوارەیەك لەگوێچکەیدابوو بازرگانیەکی بەسوودی لەلایەکی ئاوەدانەوە بۆسەرهەڵدەدات ژنی شۆخ و شەنگی تێدایە.

*ئەو كوێچكەیەی گوارەی تێدایە ژن‌و كچە.

*ئەگەر دووگوارەی لەگوێچكەیدا بینی بەگەوهەر رووكەشكرابوون جوانی‌و خۆشی‌و دنیایە بەدەستدەهێنێ‌و قورئان‌و ئاین‌و دەنگخۆشی پێدەبەخشرێ لەگەڵ دڵنیایی لەسەرجەم كارەكانیدا.

*ئەگەر لەگەڵ گوارەكەدا پارچەیەكی دی لەگوێچكەیدابوو كچی پێدەبەخشرێ، ئەگەر ژنێكی دووگیان خەوێكی ئاوابینی كوڕێكی نێرینەی دەبێت.

*گوارەو پارچە ئاڵتونێك كەبكرێتە گوێ بۆ ژن‌و پیاو وەك یەك وایە.

*ئەگەر گوارەكە زێڕبوو پیاوێكی گۆرانیبێژە، ئەگەر لەزیوبوو نیوەی قورئان لەبەردەكات.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: تاكێك گوارەم لەگوێچكەدا بینی، ئەویش وتی: لەگۆرانیدا چۆنی؟ وتی دەنگم خۆشە.

(نابلسی) دەڵێت: گوارە لەخەودا بازرگانییە بۆیەكێك لەگوێچكەی ژنەكەیدا ببینێ یان لەگوێچكەی كچێكدا، ئەگەر لەزێڕبوو هەموو قورئان لەبەردەكات، ئەگەر بەبێگەوهەربوو كوڕەكە بەئاوازەوە گۆرانی دەڵێت.

*ئەگەر ژنێكی رەبەن خەوێكی لەوجۆرەی بینی شوودەكات.

*گوارە لەگوێچكەی منداڵدا جوانییەو بۆ منداڵی باڵغ باش نییەو بۆ پیاو لەكەداری كاری ناقۆڵایە زیادوكەمی روو لەئەقڵ‌و ژیریدەكات.

*ئەگەر چەن گوارەیەكی لەگوێچكەیا بینی قورئان لەبەردەكات یاخود فێری زانیارییەكدەبێ خەڵكی سوودی لێوەردەگرن.

*گوارە بۆ ژن هاوسەرەو پارچە ئاڵتوونی دی لەگوێچكەدا منداڵەكانیەتی.

*دەگوترێت گوارە لەوەرگەی ئاژەڵ بێت یاخود ئەوەی كەدەخورێ یان ژنان خۆیانی پێجواندەكەن لەخشڵ‌و زێڕ.

*ئەگەر گوارەی لەگوێچكەیدا بینی حەز لەبیستنی گۆرانیدەكات یاخود ئامادەی كۆڕی گۆرانیبێژ دەبێ.

**گواستنەوە:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر گواستنەوەو گۆڕینی حاڵ‌و باری لەخێرەوە بۆ شەڕو خراپەو لەشەڕەوە بۆ خێر.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زەرەرو زیان بۆئەوەی دەیگوێزێتەوە، سوودیش بێت بۆئەوەی بۆی ڕەوانە دەکرێت.

*هەروەها دەڵێن: گواستنەوە شەڕو خێری هەڵگرتوە بەیەکەوە.

**گواستنەوەی شتومەك:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی بوە بەفەرمانڕەواو ئەو پۆستەش شایانی نەبێت خراپەو ڕووداوێکی ناقۆڵای پێدەگاتو دوژمنەکانی گاڵتەی پێدەکەن.

(نابلسی)دەڵێت: گواستنەوەی شتومەك لەخەودا بەپێچەوانەوە دەگەڕێتەوە وەك بینینی کەنیسە دەبێت بەمزگەوتو درەختی وشك بەداروودرەختی بەردار دەبێت، ئەوانە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گۆڕینی پلەوپایەداران یان جیاوازی بارودۆخی جیهان لەشەڕو خراپەوە بۆخێروچاکە یاخود بەپێچەوانەوە.

*هەروەها گواستنەوەی ئەندامەکانی لاشەو گۆڕینی شێوازی مرۆڤەکان.

*ئەوەی ببینێ بارگرانەو وانەبێت چاکیو باشییە لەئایندا دەبێت بەڕێزو شکۆمەندی.

*ئەوەی ببینی بوە بەمناڵ هیچ خێرێکی تێدا نییە لەهەموو حاڵوبارێکداو تووشی نەفامیو نەزانی دەبێت.

*ئەگەر ژنێك بینی پیربوە یان نیمچەپیرەو وانەبێت چاکییە لەئاینو دیندا.

*ئەگەر بینی پیربوەو دواتر بوەتەوە بەلاو ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەنددەبێت ئەگەر لەوانەبوو کەدنیا پشتی تێکردبوو دنیا ڕووی تێدەکاتەوە، ئەگەر نەخۆشبوو چاکدەبێتەوە.

*ئەگەر بینی شادی گرتوویەتی جوانبوە بەخێرایی دەمرێت.

*ئەگەر بینی لەخەودا باڵای درێژبوە ماڵوداراییو وەچەی دەبێت.

*ئەگەر بینی کورتبوە ماڵەکەی یان ماڵات یا ئوتومبیلەکەی دەفرۆشێت.

*ئەگەر کەموکوڕی بینی لەبەشێك لەئەندامەکانیشدا بینی لەکەمو کوڕییە لەئایندا.

*ئەگەر بینی چوەتە سەر شێوەی ژنێك بەڵاو نەهامەتیو ملکەچی ڕووی تێدەکات مەگەر لەخەوەکەیدا وەك خۆی لێبێتەوە.

* ئەگەر بینی عەورەتێکی هەیە وەك عەورەتی ژن ملکەچیو سەرشۆڕی رووی تێدەکات.

* هەروەها دەڵێن: ئەگەر لەبەربەرەکانیکارانبوو بائاشتی لەگەڵ رکەبەرەکانی بکات چونکە بەڵگەیە لەسەری ئەگەر ئاشتبوەوە لەگەڵی داواونیازی بەدەستدێت.

* ئەگەر ژنێك بینی عەورەتی وەك پیاوی هەیە یان ریشی هەیە ئەگەر کوڕێکی غەریبی هەبوو پەیوەندی پێوە دەکاتەوە، ئەگەر دووگیانبوو کوڕی دەبێت، ئەگەر دووگیان نەبوو هەرگیز کوڕی نابێت، ئەگەر منالێبوو کوڕەکەی دەمرێت بەرلەوەی بالغ بێت، دەگونجێت لێکدانەوەکەشی بگوێزرێتەوە بۆ پیاو بژێوی پەیداکەری باسی بەباشەو چاکە دەکرێت بەئەندازەی گەورەیی ئەو عەورەتە.

* ئەگەر ژنێك بینی پیاوێك لەگەڵ ژناندا جووت دەبێت لێکدانەوەکەی بۆ بژێوی پەیداکەری دەبێتو پلەوپایەو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت.

* ئەگەر بینی کلك یا شاخ یان سمو پەرچەمی هەبێت لەلێکدانەوەدا باشە.

* هەروەها ئەگەر بینی دەنووکو شفرە یا لمۆز یا هەرشتێکی زیادەی لاشەی هەیە هەمووی دنیایەو بەباشە دەگەڕێت (پشت بەخوا).

* ئەگەر بینی ئەندامێکی گوێزراوەتەوە بۆ جەستەی ئاژەڵێك ئەگەر درندەبوو زاڵدەبێت بەسەر بەرانبەرەکەی بەماڵو سامان یا بەدەستەلاٌت یاخود بەپلان یان بەفێڵو تەڵەکە، ئەگەر بوو بەئاژەڵێکی گۆشتخۆر بەڵگەیە لەسەر خێروچاکەی، یان رسواییوسووکی.

* ئەگەر بینی وەك باڵندە پەڕوباڵی هەیە پلەوپایەو خێری بەدەستی دەهێنێت.

* ئەگەر بینی بەباڵەکانی دەفڕێ بەپلەوپایەداریی سەفەر دەکات بەئەندازەی بەرزبوونەوەی بەسەر زەویدا.

* ئەگەر بینی لەشولاری بوە بەگڵێنە یان شووشەو فەخفوری نامێنێت.

* ئەگەر بینی بوە بەئاسن تەمەنی درێژدەبێت.

* ئەگەر بینی بوە بەتاقو پردو خەڵکی بەسەریا دەپەڕنەوە دەبێت بەفەرمانڕەوا یان هاوچەشنی ئەو یاخود بەزانایەكو خەڵکی لەکاروبارەکانیدا پەنای بۆ دەبەن.

*ئەگەر بینی بوە بەگۆچان و گالۆك لەخەودا خێری تێدا نییەو خراپەیە لەئاین دنیایدا.

*ئەگەر بینی بوە بەگۆچان خێری تێدا نییە خراپەیە لەئلین و دنیایدا مەگەر شوێنکەوتەبێت لەئاینیدا.

*ئەگەر یەکێك منداڵی نەخۆشی هەبێت و ببێت بەباڵندە دەمرێت.

*ئەگەر بینی بوە بەمەیمون یان هاوشێوەی ئەوە لەناوچوونی نازونیعمەتە.

*ئەگەر بینی بوە بەوشتر یان ئاژەڵ یاخود درندە یان هاوچەشنی هیچ خێرێکی تێدا نییە لەئایندا بەتایبەت لەهەموو حاڵێکدا.

*ئەگەر بینی بوە بەباڵندە دەبێت بەکەشتیار لەسەر زەویداو حەز لەسەفەر دەکات و، بژێوی لەبژێوی ئەو باڵندەیە دەکات.

*ئەگەر بینی بوە بەدرندەیەك لەکۆمەڵی موسوڵمانان جیادەبێتەوەو گۆشەگیردەبێت.

*ئەگەر بینی بوە بەئاسك لەبژێویدا خێر دەبینێ لەژن و منالان.

*ئەگەر بینی بوە بەمانگا یان درندەیك خێر لەژن وەردەگرێت.

*ئەگەر بینی بوە بەبەراز بژێوی زۆردەبێت و خۆی ملکەچدەبێت.

*ئەگەر بینی بوە بەجاڵجاڵۆکە بەندایەتیدەکات و تەوبەو پەشیمانی لەتاوان و گوناهێکی زۆر دەردەبرێت.

**گواستنەوەی شتومەك بۆ شوێنی باشتر:**

(نابلسی)دەڵێت: ئەو خەونە بەڵگەیە لەسەر فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە، ئەگەر گواستیەوە بۆ شوێنی نزمتر بەلگەیە لەسەر رێگری لەچاکەو فەرمان بەخراپە یان گۆرینی خراپ بەچاکە یا چاك بە خراپە.

**گورچیلە:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: هەردوو گورچیلە شوێنی دەوڵەمەندی و راستی و رەوانبێژی و هەڵەیە.

*ئەگەر بەقەڵەوی بینی پیاوێکی دەوڵەمەندی خاوەن دواندن و راستییەو لاوازی گورچیلەکانیش هەژاری و هەڵەیی راوبۆچوونە.

*هەروەها دەڵێن: گورچیلە خزمایەتییە، باشی و خراپیان بۆ ئەوە دەگەرێتەوە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا هاوکارو یارمەتیدەرە، لەدەستدانی گورچیلەیەك لەدەستدانی یارمەتیدەرو پەناو پشتگیرە، لەدەستدانی هەمووشیان بەلگەیە لەسەر دلرەقی.

* هەردوو گورچیلە پیاوێکی بەهێزو توانایەو لەکاری فەرمانڕەوادایەوماڵو سامانە بۆ خەڵکی خەرجدەکرێ.
* هەروەها بەڵگەیە لەسەر پەنجەکانی مرۆڤ.

**گورگ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گورگ دوژمنێکی ستەمکاری درۆزنو دزو ناپاکە، ناپاکی ئەنجامدەدات لەگەڵ هاوەڵەکانیو فروفێڵیان لەگەڵدەکات.
* ئەگەر گورگێك بچێتە ماڵەکەی دز روو لەماڵەکەیدەکات.
* گۆڕینی دز لەشێوازی خۆیەوە بۆ شێوازێکی تری ئاژەڵی درێکە تەوبە دەکاتو پاشگەزدەبێتەوە.
* ئەگەر توولەگورگی بینی بەخێویدەکات ئەوە منداڵێکی فڕێدراو لەوەچەو پشتی دزێك بەخێودەکاتو تێکچوونی ماڵو حاڵەکەی لەسەر دەستی ئەو منداڵەدا دەبێت.
* هەروەها دەڵێن: ئەوەی گورگێك ببینێ پیاوێکی پاكو تاوانباردەکات بەپێی چیرۆکەکەی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت) لەبەرئەوەی دز ترسو بیمو لەکیسچوونی کاروبارە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر گورگێکی بینی بوە بەگا منداڵێکی دز دەبێت بەپیاوێکی دادپەروەری بەخشندە.

* هەروەها دەڵێن: ئەوەی لەخەودا گورگێك ببینێ گوتارێکی باشدەبیستێ لەلایەن گەورەکەیەوە یاخود خێرێك بەدەستدەهێنێت، بەلاًم ئەگەر راویکرد شادیو خۆشی بەدەستدەهێنێت لەگەڵ شەهیدبووندا.
* گورگ بەڵگەیە لەسەر رۆژەکانی ساڵ چونکە گورگ شوێنی گورگ دەکەوێت بەپەلە رێگەدا ئەگەر لەئاوێك پەڕینەوە هەروەها چۆن رۆژەکانی ساڵ بەدووی یەکدا دێن.
* هەروەها گورگ بەڵگەیە لەسەر دوژمنێکی دز کاروکرداری ئەو ئەنجامدەدات بەئاشکرا.
* ئەگەر بینی بوە بەگورگ لەخەودا شادیو خۆشی بەدەستدەهێنێت.
* شیری گورك ترسو بیمو بەسەرچوونی کاروبارە، گورگ دەستەلاًتدارێکی ناپاكو بێ وادەیە، یاخود دزێکی کزو لاوازە یان پیاوێکی درۆزنو بێ بەڵێنە.
* ئەگەر لەخەودا سەگێکی بینی لەگەڵ گورگدا یەکیانگرتوە بەڵگەیە لەسەر دووڕوویيو ناپاکیو دەستبڕین.

**گوشەر:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر گوشەرێك دانرا لەشارێکدا بەڵگەیە لەسەر:

+فەرِو پیت لەو شارەدا.
+نەبوونی قاتو قڕی.
+مەرگی شیردەر.
* هەروەها لەخەودا ئەگەر گوشەری قامیشی شەکربوو بەڵگەیە لەسەر دنیاو رووتێکردنی بەهۆی رزقو رۆزییە جیاوازەکانەوە.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+ئەسپەردەکردن.
+ماڵوسامان.
+سوودو قازانج بڵاوکردنەوە.
+بڵاوبوونەوەی زینـدانیانو دەرچوون لەنارەحەتیو قەیران.
+حەمام.
+قوتابخانە.
+خەڵوەتگەو تەکیە.
* گوشەری زەیت بەڵگەیە لەسەر رێنومایی گومڕاو زانیاریی بۆ قوتابی.
* هەروەها گوشەر بەڵگەی خێرە بۆ شیردەری منداڵ.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی خاوەن ماڵو داراییە. ئەگەر بینی کونجی گوشی ماڵو سامانی لەزیادبوندادەبێت هەروەها گوێزیش هەر بەوچەشنەیە.
* گوشین بەڵگەیە لەسەر نیشتمان، ترشیاتکار پیاوێکە لەخەڵکی خواناس نزیکدەبێتەوەو رمان بەسەر خەڵکیدادەدات خۆیان بەدووربگرن لەخۆشیەکانی دنیاو هاوکارییان دەکات لەسەر خواناسی.
* گوشەی رۆنی گوێز پیاوێکی رەنجبەرو مێشدوەو خاوەن ماڵو داراییەکی نەشونماکارە.
* گوشەری تری بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی ئاینو فیتنەو ئاشوب.
* گوشەری رۆن بەڵگەیە لەسەر دەروولێکردنەوەو قوتاربوون لەغەمو پەژارەو زانایانو لێکۆڵەرەوانو بینینی بەڵگەیە لەسەر:
+ئالوودەبوونی حەزو ئارەزوو.
+بیدعەکاری.
+بەجێهێنانی کاری نابەجێ.
* بینینی بەڵگەیە لەسەر رێنومایيو دەرچوون لەتاریکارییو روو بەنورو رووناکی چوون.
* هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر رزقو رۆزیو سوودو قازانج.
**گوڵ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گوڵ کوڕ یان ماڵێکی رێزدارە ، هەروەها دەڵێن: گوڵ بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی ئاوارەیەك یان هاتنی كتێبێك.
* هەروەها دەڵێن: گوڵ ژنێکە لەمێرد جیابوەتەوە یان کوڕێکی دەمرێ یاخود

بازرگانیەکە بەردەوام نابێت یان خۆشیی و شادییەکە بەهۆی زوو هەڵوەرانی گوڵەوە تیادەچێت.

*ئەگەر بینی لاوێك گوڵێکی پێدا دوژمنێکی بەڵێنی پێدەداتو بەردەوام نابێت لەسەری.

*ئەگەر تاجەگوڵینەیەکی لەسەرسەری بینی ژنێك دەهێنێو بەخێرایی ئاژاوەو ناتەواویی دەکەوێتە نێوانیان.

*ئەگەر ژنێك خەوێکی وای بینی مێردە بەوسیفەتەوە.

*گوڵی راخراوو خۆشی دنیایە بەبێنەوەی هێزو مانەوەی هەبێت.

*برینی گوڵەباخ غەمو پەژارەیەو گوڵ لێکردنەوە خۆشییە.

*لێکردنەوەی گوڵی سپی لەبێستاندا ماچکردنی ژنێکی داوێنپاکە ، ئەگەر گوڵەکە سووربوو ژنەکەی خاوەن ئارەزوو خۆشیو شادییە.

*ئەگەر گوڵەکەی بەزەردی بینی ژنێکی نەخۆشە ، لێکردنەوەی خونچە کەهێشتا نەکراوەتەوە بەڵگەیە لەسەر لەبارچوونی کوڕ ، هەروەها دەڵێن: گوڵ باسکردنی باشە، ئەگەر گوڵێکی گەلا گەورەی لێکردەوەو گوتی خراپە بەرانبەر ژنێکی شۆخو شەنگ دەکریو بێتاوانە لێی.

*هەندێکدەڵێن: بۆنداران زۆروکەمی غەمو پەژارەیە، گوڵ گریانو غەمو پەژارەیە ئەگەر ئەو شوێنەی ببینرێ کەتێدا ناسراوە بێنەوەی دەستی لێبدات یان لێیبکاتەوە.

*رێحانە گریانە ئەگەر لەشوێنی خۆی هەڵکەنراو نەما.

*بەهەمان شێوە گوڵو مۆردو ئەوەی بۆنو بەرامی هەیە لەگەڵ پاقلەو ئەوەی رەنگەکانی نابژێرێ غەمو پەژارەیە خواردنی پاقلەواتیش غەمو پەژارەیە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی گوڵی چنییەوە رێزو خۆشەویستیو نازو نیعمەت بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر لەباخێکدا گوڵی سووری چنییەوە بەڵگەیە لەسەر زیرەکیو بیرساغیو نزیکبوونەوە لەخەڵکیو نەرمو نیانی.

*گوڵ بەڵگەیە لەسەر خۆشیو شادی.

*ئەگەر نەخۆشێك گوڵی راخراوی لەژێر خۆیدا بینی یان جلوبەرگی گوڵینی پۆشی دوای چل رۆژ دەمرێت چونکە ماوەی مانەوەی گوڵ ئەوەندەیە.

*گوڵەباخ بەڵگەیە لەسەر کۆمەڵێکی بۆڵەبۆڵکارو کرداری غەمو پەژارەهێنەر.

* گوڵچنینەوە خۆشحاڵییەو دەگونجێت گوڵی زەرد بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی هی سووریش جوانیبێت.
* دەگونجێت گوڵی سپی بەڵگەبێت لەسەر درهەمو هی سوور دینار.
* گوڵی سوور دیارو بەهێزترە لەبەڵگەدا.
* لەخەودا چێژو خێرە، ئەگەر بینی تاجەگوڵینە بەسەریەوەیەتی ژندەهێنێتو تامو چێژ لەدنیادا بەدەستدەهێنێت.
* ئەگەر گوڵی بینی بەڵام لەکاتی خۆیدا نەبوو غەمو پەژارە رووی تێدەکات.
* ئەگەر گوڵ هەڵبگریو لەدەستبڕەکان بێت ئەوە دەستگیردەکریٚ، نەخۆشدەمریٚو گوڵی هەمەڕەنگو جۆراوجۆر بەڵگەیە لەسەر دنیاو خۆشیەکانی.
* گوڵ مژدەی دووگیانبوونی ژنانە لەگەڵ دەرولێکردنەوەو رەواندنەوەی غەمو پەژارە.

**گولاو:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گولاو ماڵو پیاهەڵدانو لەشساغیو چاکییە.

**گولاوپرژێن(عەتردان):** بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+لابردنی ئەوەی کارێکی پێسپێردراوە.
+چاکبوونەوەی نەخۆش.
+سەفەر بۆئەوەی خوازیاری سەفەرە.
+سەرکەوتن بۆ شەڕکەران.
+شاییو ئاهەنگی هاوسەرگیرو هاوچەشنی.

* یاخود کچو ژنو منداڵە، هەروەها دەڵێن: گەنجینەدارە ئەگری خەرجی ماڵی پێسپێراوە.

**گوڵە بەیبوونە:** گوڵە بەیبوونە ئاوەڵزاوای پیاوە، ئەوەی ببینیٚ گوڵە بەیبوونە لێدەکاتەوە هەندێك لەخزمەکانی هاوسەرەکەی دەکەن بەهاوڕێی خۆیان.

**گوڵەشلێر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گوڵەشلێر پیاهەڵدانی باشە، هەندێکدەڵێن: بەڵگەیە لەسەر خراپە چونکە ناوەکەی لە(سوء - خراپە)وە سەرچاوەیگرتوە.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر رێبازو سوننەت یان خراپە، هەروەها دەڵێن: ئەگەر لەخەودا گوڵەشلێری بینیو پێیدرا خراپەی ساڵێکە.

**گوڵەگەنمو جۆ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گەنمو جۆی دەستی مرۆڤ یان سەرخەرمان یاخود کۆکردنەوەی لەدەفرێکدا ماڵو سامانێکە بەدەستیدەهێنێت لەکارو پیشەی کەسانیتر یاخود زانیارییەکە فێردەبێت.

*ئەوەی گوڵەگەنمو جۆی پەرشو بڵاوی هەڵگرتەوە لەزەویداو خاوەنی زەوییەکەی ناسیەوە ماڵێکی پەرشو بڵاوی لەهاوەڵێکەوە دەستدەکەوێت.

*ئەگەر بینی کشتوکاڵەکەی کەدەدورێتەوە لەکاتی خۆیدا نییە بەڵگەیە لەسەر مردن لەو شوێنە یاخود لەجەنگدا، ئەگەر گوڵەگەنمەکان زەردو ئاڵتوونیبوون بەڵگەیە لەسەر مەرگی پیاوە بەتەمەنەکان ، ئەگەر سەوزبوو مەرگی لاوو کوشتنیانە.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی کشتوکاڵی سەوز بەڵگەیە لەسەر ماڵێکی جەمکراو کەزیاد دەکات، گوڵەگەنمی سەوز بەقەدەکەیەوە رزقو رۆزیو فەرپیتە، گوڵەگەنمی وشکیش نەبوونیو قاتیو قرپیە.

*دەگونجێت گوڵەگەنم بەڵگەبێت لەسەر نارەحەتی هەروەك چۆن گوڵەگەنمو جۆ بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی پاداشت.

*دەگونجێت گوڵەگەنمەکان بەڵگەبێت لەسەر ساڵانی دنیا بەمانگو رۆژەکانیەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵوسامانی دنیا لەگەڵ گەنجینە.

**گوڵێك:** لەخەودا ژنێکی جوانە، ئەوەی بیبینێ ژنێکی شۆخو شەنگو جوان دەستنیشاندەکات خەڵکی پێی سەرسامدەبنو ئەو ژنەش خزمو کەسی خۆی نییە.

*هەروەها لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+ئامرازەکانی کەیفو خۆشی دەربڕین.

+پێکەنینو وێنەگرتنو جلوبەرگی جوانو رازاوەیە.

*دەگونجێت هاوسەرگیری ئەنجامبدات یاخود گورانیبێژێك بەکرێ بگرێ.

*ئەگەر بینی تێکەڵ بەمانگبوە یاخود هاتۆتە خوارەوە یاریکردنە بەمندالان یاخود دەگونجێت کەسی شێتو گێلبێت کەواهیچ سوودو قازانجی لەقسەو گفتوگۆیا نییە.

*هەروەها ژنی پادشاو بەرپرسە.

*هەروەها دەڵێن: ژنێکی بیانییە، ئەگەر بینیو رەبەنبوو ژنێکی بەدەر لەنەتەوەو زوبانی خۆی دەکات بەهاوسەری.

**گومان( دوودڵی ):** (نابلسی) دەڵێت: لەکوتەی پەروەردگاردا هاتوە بەڵگەیە لەسەر دووڕوویو فڕوفێڵو چاوبەست. دەگونجێت دووڕوبێتو خوداوەند لەرۆژی قیامەتدا تەماشای نەکات یاخود هاوسەری داوێنپاکی تومەتباربکات.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا گوناھ بەپێی ئایەتی: ﴿ انَّ بَعْضَ الظَّنِ اثمٌ﴾ (الحجرات: ١٢).

**گومەز:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گومەزمێزە، ئەگەر بینی گومەزێکی لەسەر هەور دروستکرد دەستەڵاتو هێزی دەستگیردەبێ.

*ئەگەر بینی بیناو ساختمانی هەیە لەنێوان ئاسمانو زەویو چەندین گومەزی سەوزی تێدایە باشی حاڵوبارو مردنییەتی بەشەهیدی.

*بیناو ساختمان دروستکردن بەڵگەیە لەسەر هێنانی ژن.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی بینایەك دروستدەكات هاوڕێو خزمە نزیکەکانی لەخۆشیدا کۆدەکاتەوە.

*ئەگەر بینی گڵکاری گۆڕی پێغەمبەریکرد (ﷺ) بەماڵو پارەیەك (حەج)دەکات.

*ئەگەر خشت کۆکرابوەوە بەڵام لەبیناسازیدا بەکار نەدەهێنرا پارەوپووڵە.

*ئەگەر بینی بینایەکی کۆن نوێدەکاتەوە بۆ زانایەك باسوخواسی ئەو زانایە دووبارە دەهێنێتەوە پێش.

*ئەگەر ساختمانو بیناکەی فیرعەونبوو یان ستەمکارێك نوێکردنەوەی باسو خواسییەتی.

*پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: "ئەگەر لەخەودا بینی بینایەك دروستدەکات کردارێك ئەنجامدەدات".

*ئەگەر بینی دەستیکردوە بەدروستکردنی بینایەكو لەبناغەوە چاڵیکردو بینایکرد هەتا بەرزو بڵندیکردەوە داوای زانیاریو دەستەڵاتو پیشەیەکدەکاتو پێداویستی خۆی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی بینایەك دروستدەكات لەشارێك یان گوندیك لەو شوێنەدا ژنێکدەهێنێ، ئەگەر لەشووشە دروستیکرد خۆڕازاندنەوەو ڕووپامایییە، ئەگەر لەقوڕ دروستیکرد حەڵاڵو بژێوییە.

*ئەگەر نەخشداربوو دەستەڵاتو زانیاریو شادیو خۆشییە ، ئەگەر لەگەچ دروستیکرد یان لەخشتو وێنەی لەسەربوو ڕوو لەقسەو وتەی پووچو بەتاڵدەکات.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ژنێکە هێناویەتیو مارەییەکی زۆریداوە، ئەگەر گومەزێکی ڕووخاندو ژنەکەی نەخۆشبوو دەمرێ، ئەگەر لەشساغبوو تەڵاقیدەدات.

*گومەز دەستەڵاتە بۆیەکێك خاوەنی بێت یان بچێتە نێوی.

*ئەگەر کۆمەڵە گومەزێکی زۆری بینی یان دروستیکرد لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەرزبوونەوەی پلەوپایەی یان چوونە ریزی چارەنووسدارانەوە.
*ئەگەر گومەزو باڵندەی بینی بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەو شکۆمەندی.
*گومەزی لەخشتدروستکراو دەستەلاتدارە.
*ئەگەر بینی گومەزێکی خشتی لەسەر دروستکراوە بەزووترین کات دەستەلاتێکی پرشکۆو شانازیو شکۆمەندی دەستگیردەبێ.
*گومەز لەماڵدا ژنێك یان رێكوپێکییە لەلایەن ژنەوە.
*پیاوێك دەڵێت: لەخەودا بینیم گومەزێك دروستکرابوو چوار پیاو رووخاندیان، راڤەکاری خەویش وتی: زانایەك دەمرێ، دوای دوو رۆژ یەکێك لەزانایانی گوندێکی (دمشق)مرد.
**گون**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: جووتە گون پەتو هۆکاری دوژمنەو بەهۆیەوە دەگەن بەمەردووم.
*ئەگەر هەردووگونی بینی برابوو بەبێئەوەی بۆگەن بکەن یا زیانیان پێبگات دوژمنەکانی زەفەری پێدەبەن بەئەندازەی ئەوەی تووشی هەردووگونی هاتوە، ئەگەر گونەکانی بینی گەورەبوون یاخود هێزو توانایەکی زیاتریان هەیە لەهی خۆیان دوژمنەکانی ناتوانن زیانی پێبگەیەنن.
*ئەگەر بینی گونی بەخشیوە بەکەسانیتر بەویستیو ئەوەی لێدەرکەوت کورێکیدەبێت بەنادروستیو دەدرێتەپاڵ یەکێکیتر.
*ئەگەر گونەکانی بەدەستی پیاوێکی ناسراوەوە بینی زەفەری پێدەبات، ئەگەر ئەو پیاوە لاوبوو دوژمنێتی.
*ئەگەر شیری تێهات ماڵو داراییەك بەدەستدەهێنێت دڵنیا نابێت لەدوژمنەکانی.
(نابلسی) دەڵێت: جووتەگون شوێنی چێژو خۆشینو، دەگونجێت بەڵگەبێت:
+هەردوو هاوسەر.
+دووکوڕ.
+دووپیشە.
+دوو دەرگاوان.
*ئەگەر بینی هەردوو گونی کەوتوونەتە دەستی دوژمنەکانی بەو ئەندازەیە دەستیان پێدەگات.
*دەگونجێت جووتە گون بەڵگەبێت لەسەر دوو خوشكو دوو کچو دوو هاوسەر یان دایكو پوور.
*ئەگەر گونەکانی بینی براون ئەگەر دوو نەخۆشی هەبوو دەمرن، ئەگەر دوو هاوسەری هەبوو دەمرن.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵو دارایی، ئەگەر بینی گونەکانی بڕاون پارەیەکی لێداوا دەکرێتەوە، ئەگەر هیچی نەبوو رەچەڵەکی دەبچڕێو رزق و رۆزی ئەستەمو دەبێتو نیعمەتی خوایی لێدەسەنرێتەوە.

* ئەگەر بینی بەویستی خۆی گونی بەخشیوەو لێی بووەوە کوڕێکی دەبێتو نادروست دەبێتو کوڕەکەی دەدرێتە پاڵ کەسێکیتر.

* دەگونجێت جووتە گون بەڵگەبێت لەسەر:

+جموجووڵ.

+ئەوەی مرۆڤ لەسەری دەنوێت لەسیسەم یا دەیخاتە ژێرسەری لەسەرین.

*ئەگەر ژنێك بینی دوو عەورەتی هەیە دەگونجێت دوانەیەکی ببێ.

*ئەگەر پیاوێك بینی جووتە گونی هەر نییە یاخود بەهۆی نەخۆشییەوە بڕاون بەهۆی دەردە شێرو دەردە رێوی دەگونجێت ژنەکەی تەڵاق بدات یاخود منداڵێکی لەدەستبدات یا بژێوی‌و کاروکاسبی کەم‌و کوڕی تێبکەوێت، ئەگەر ئیش‌وکاری کێشانە بکات کێشانەکەی دەشکێ، ئەگەر هاوسەرداربێ گەورەی ژنەکەی‌و خزمی نزیکی لەدەستدەدات، یاخود دەگونجێت لەخۆ پارێزییەوە بچیت بۆ خوار ئەوە.

**گوناه(تاوان):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەنجامدانی گوناهو تاوان بەڵگەیە لەسەر قەرزکردنی خاوەنەکەی هەروەك چۆن قەرزکردن بەڵگەیە لەسەر گوناهو تاوان.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا قەرزە، ئەگەر کۆمەڵێ گوناهو تاوان ببینیێ کۆبوەتەوە لەسەری قەرزە، داننان بەگوناهو تاواندا مەزنی‌و رێزداری‌و شکۆیە.

**گوناهو تاوانی بچووك:**

(نابلسی)دەڵێت: شارەزاییە لەخراپەکاران‌و بەڵگەیە لەسەر لێخۆشبوون لەتاوانەکان بەپێی ئایەتی: ﴿إِلاَّ اللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ﴾(النجم:٣٢).

**گوند(لادێ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گوندێکی ناسراو بەڵگەیە لەسەر خۆی یان دانیشتوانەکەی‌و ئەوەی لێوەی دێت چونکە هەموو شوێنێك بەڵگەیە لەسەردانیشتوانەکەی هەروەك پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَاسْأَلِ الْقَرْيَةَ ﴾ (یوسف: ٨٢) واتە لەدانیشتوانەکەی بپرسە.

*دەکونجێت بەڵگەبێت لەسەر لانەی ستەمو بیدعەو خراپەو دەرچوون لەکۆمەڵو نامۆبوون لەراوبۆچوونی دانیشتوانی شاردا هەربۆیە خوداوەند باسی رۆڵی ستەمکارانی چواندوە لەگوندەکاندا.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر:

+لانەو ماڵی مێرووله.

+گوند خۆی.

*ئەگەر ئەو گوندە ناسراوبوو دەستەڵاتدار دەدات بەسەریا.

*دەکونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+کولله.

+سەرما.

+دەردو نەخۆشی.

+پرکردنەوەی کونەمێرووڵەو لەسەربانی ماڵدا.

*ئەگەر بینی چوەتە نێو گوندێکی تۆکمەو قایم دەکوژرێ یاخود کوشتار بەرپادەکات بەپێی ئایەتی: ﴿لاَيُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلاَّ فِي قُرًى مُحَصَّنَةٍ﴾ (الحشر: ١٤).

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی لەشارەوە دەچێت بۆ گوند کارێکی سووکو نزم هەڵدەبژێرێ بەسەر کارێکی قورسو گراندا یاخود کارێکی دیاریکراو ئەنجامدەدات وادەزانێ سنووردار نییە یاخود خێرێك ئەنجامدەدات وادەزانێت شەروخراپەی کردووەو پاشگەزدەبێتەوە لێیو سوودی نییە لەبۆی.

*ئەگەر بینی چوەتە نێو گوندێك دەستەڵاتێك بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر لەگوندێك هاتەدەرەوە بەجێیهێشت لەنارەحەتی قوتاردەبێتو پشوودەدات بەپێی ئایەتی: ﴿أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا﴾ (النساء: ٧٥).

*ئەگەر بینی گوندێکی ئاوەدانو وێرانبوو کشتوکاڵو کێڵگەکان کاولبوون بەلاو نەهامەتییە بۆ خاوەنەکانی، ئەگەر بەئاوەدانی بینی چاکی ئاینی خاوەنەکەیەتی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ستەمو تیاچوونە بەپێی ئایەتی: ﴿قَالُوا إِنَّا مُهْلِكُوا أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ﴾ (العنكبوت: ٣٦).

*ئەگەر بینی لەگوندێك دێتەدەرەوە چاکییە بۆی لەئایندا.

*ئەگەر بینی لەگوندەوە دەچێ بۆ شار لەماندوبوونەوە دەچێت رووبەپشوو لەترسەوە بۆ دڵنیایی.

*ئەگەر بینی لەشارەوە دەچێت بۆ گوندێك پێچەوانەی ئەوەیە.

**گوێ**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: گوێ هاوسەری پیاوە یان کچەکەیەتی، ئەگەر بینی سێ گوێچکەی هەیە بەڵگەیە لەسەر ژنێکو دوو کچ، ئەگەر چوار گوێچکەی هەبوو خەوەکەی دوو لێکدانەوە هەڵدەگرێت:

١)دەگونجێت چوار ژنی هەبێت.

٢)چوار کچی بۆ دایکی هەبێت.

*ئەگەر بینی گوێچکەکانی بەدەرکەوتووە ئەوا ژنەکەی تەلاقدەدات یان کچەکەی دەمرێت.

*ئەگەر بینی یەك گوێچکەی هەیە کەسێکی نزیکی دەمرێت.

*ئەگەر بینی خاوەن نیو گوێچکەیە خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر مردنی ژنەکەیو هێنانی ژنێکیتر.

*ئەگەر بینی لەیەکێك لەگوێچکەکانیدا ئەموستیلەیەك هەڵواسراوە کچەکەیدەدات بەشوو منداڵێکی نێرینەیدەبێت.

*هەروەها وتویانە: ئاین گوێچکەیە، ئەگەر بینی گوێی ئاخنی بەشتێك بەڵگەیە لەسەر بێباوەڕی، ئەگەر بینی خاوەن چەن گوێچکەیەکە حەقو راستی بۆ دەخرێتەڕوو ، بەڵام پێی قایل نابێت بەپێی ئایەتی: ﴿أَمْ لَهُمْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ (الأعراف: ١٩٥).

*هەروەها وتویانە: ئەگەر کەسێکی دەوڵەمەند چەن گوێچکەیەکی جوانی هەمە چەشنی بینی گوێبیستی هەواڵی خۆشدەبێت، بەڵام ئەگەر گوێچکەکان هەمە چەشنو جوان نەبوون هەواڵی ناقۆڵاو خراپ دەبیستێ.

*ئەوەی چاو لەگوێچکەکانیدا ببینێ تووشی کوێریدەبێتو ئەوشتانەی بەدی دەکات بەچاوەکانی بەگوێ دەیبیستێ.

*هەروەها وتویانە: ئەوەی ببینێ خاوەن چەن گوێچکەیەکە زۆرباشە بەتایبەت بۆ ئەوانەی دەیانەوێت کەسێك گوێڕایەڵیان بکات وەك ژنو منداڵو خزمەتکار، بەڵام بۆ دەوڵەمەند بەڵگەیە لەسەر هەواڵی خۆش ئەگەر گوێچکەکان جوانو هەمەچەشنبوون، بەڵام ئەگەر جوانو باشو هەمەچەشن نەبوون بەڵگەیە لەسەر هەواڵی ناخۆش، بۆ زەبوونو کەسانی ناکۆکو دووبەرە بەڵگەیە لەسەر بەندایەتیو بەردەوامبوونیو لایەنی ناکۆکیش بەڵگەو بڕیار بەسەریا دەچەسپێنێ.

*دەگێڕنەوە کەسێك بینی لەخەودا خاوەنی دوانزە گوێچکە زیاترە، خەوەکەی لای خەولێکدەرەوەیەك

گێڕایەوە ئەویش وتی: ئەگەر ئەوکەسەی خەوەکەی بینیوە خاوەن بڕیاربێت بەسەر کەسانیدیدا خێرو چاکەی زۆری پێدەگات، خۆئەگەر دەوڵەمەندبێت هەواڵی پێدەگات بەئەندازەی گوێچکەکانی لەولاتانەوە بەهۆی بژێوییەوە، ئەگەر زەبوونیشبوو غەمو پەژارە رووی تێدەکات، ئەگەر ناحەزو دوژمنداربێت دادوەر فەرماندەدات بەسەریا بەبڕیاری گرانو وتەو گوتەی زبرو رەقیش دەکات بەرانبەری، ئەگەر ناکۆکیشبوو زاڵو سەرکەوتوودەبێت بەسەر نەیارو ناکۆکەکانی.

* (نابلسی)دەڵێت: گوێچکە شوێنی بێداریو پلەوپایەیە بۆیە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر منداڵو ماڵو سامانو پلەوپایە. دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانیاریو ئەقڵو دینو دەستەڵاتو خزمو کەسو کار کەمرۆڤ پێوەیان جوانو رازاوە دەبێت ، ئەوەشی ببینێ گوێچکەی گەورە بووە یان جوان بووە یاخود رووناکی لێوە دێتە دەرەوە یان دەچێتە نێوی بەڵگەیە لەسەر رێنوێنیو گوێڕایەڵی بۆ پەروەردگارو وەرگرتنی بڕیارو فەرمانەکانی.

* ئەگەر بینی لەخەودا گوێچکەی بچووکەو بۆنی ناخۆشی لێدێتەدەروە یان دەچێتە ناوەوە بەڵگەیە لەسەر خراپە، دەگونجێت گوێی زیادەش بەڵگەبێت لەسەر رێگەدانو مۆڵەت پێدان، ئەگەر گوێچکەکانی جوان بوو ئەوەی دەیەوێت باشو چاکە.زۆری گوێچکە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هونەری زانستەکان یان جێگیر نابێت لەسەر حاڵو بارێك.

* دەگونجێت گوێچکە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی دەچێتە نێویەوە.

* ئەگەر بینی گوێچکەکانی بووبوو بەگوێچکەی هەندێك لەئاژەڵان پلەوپایەکەی لەدەستدەداتو رێزو شکۆمەندی کەمدەکاتو بیستنی سارددەبێت.

* ئەگەر بینی هەردوو پەنجەی خستۆتە گوێچکەیەوە بەڵگەیە لەسەر مردنی بەبیدعەوە، ئەگەر بیدعەچیبوو بەڵگەیە لەسەر مەرگیو سووربوونی لەسەر وازلێهێنانی ئەوەی ئەنجامیداوە یاخود دەبێت بەبانگبێژ.

* گوێی پادشاو فەرمانڕەوا سیخوڕەکانیەتی.

* گوێچکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شتی تێدەکرێ لەکیسەو سندووقو گەنجینە.

*ئــەوەی ببینــێ بەباشــی ببیــستێ بەڵگەیــە لەســەر تێگەیــشتن‌و راســتی‌و ئاین‌و دڵنیایی.

*ئەوەی ببینــێ کــەڕە بەڵگەیــە لەســەر تێکچوونی ئاینی.

*ئەوەی ببینێ گوێچکەی براوەو کەس نەزانێت یەکێك ژنەکەی یان کچەکەی هەڵدەخەڵەتێنێ، ئەگەر چاك‌و باش بووەوە ژن‌و کچەکەی تەوبەدەکەن‌و پاشگەزدەبنەو دەگەڕێنەوە بۆچاکە.

*ئەوەی ببینێ لەچڵك‌و پیسی گوێی دەخــوات زینــا لەگــەڵ منــاڵ‌و نێرینەدادەکات.

**گوێبیستی پشکنینی پزیشك:** لەخەودا بەڵگەیــە لەســەر پێــشکەوتن‌و ســەرکەوتن، دەگونجێــت بەڵگــەبێت لەســەر چــاکبوونەوە لەنەخۆشــی، هەروەها بەڵگەیە لەسەر دەرخستنی کەموکوڕی.

**گوێدرێژ (کەر):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گوێدرێــژ بــاپیرەی مرۆڤــە بەهــەر چەشــنێك ببینــی ئەگــەر قەڵــەو یــا لاوازبێت.

*ئەگەر بەباشــی دەڕۆیــشت بــەڕێوە سوودو قازانجی دنیایە.

*ئەگەر جوانبێت جوانی‌و قەشەنگی خاوەنەکەیەتی.

*ئەگــەر ســپیبوو ئــاین‌و گەشــەی خاوەنەکەیەتی.

*ئەگەر لاوازبوو هەژارییە ، قەڵەویش مــاڵ‌و دارایــی خاوەنەکەیــەتی، ئەگــەر رەشبوو شادی‌و مامەڵەی خۆشیەتی لەگــەڵ موڵــك‌و دەســتەڵاتو فەرمانڕەوایی.

*ئەگەر رەنگی سەوزبوو پارێزکاری‌و ئاینداریيە.

(ئیبن سیرین) لەنێو سەرجەم ئاژەڵاندا گوێدرێــژی لاباشــتربوو، هــەروەها گوێدرێــژی رەشــیش لەپێــشتربوو، گوێدرێــژێ بەزینــەوە کوڕێکــە لەشکۆمەندیدایە.

*درێــژی کلکــی گوێدرێــژ مانــەوەی دەستەڵاتو پۆستی فەرمانڕەواییە.

*تــۆپینی گوێدرێــژ بەڵگەیــە لەســەر مردنی خاوەنەکەی.

*سمــی گوێدرێــژ سەرچــاوەی مــاڵ‌و داراییەکەیەتی.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر گوێدرێژەکەی بتــۆپێ مــاڵ‌و دارایــی لەکیسدەچێت ئەگــەر وانــەبێت پەیوەنــدی دەبــچڕێ یــاخود خزمەتکارەکــەی دەمرێــت یــا باوك‌و باپیری دەمرن کەبەخێویانکردو

رزق و رۆزیان بۆ پەیدادەکرد، ئەگەر واش نەبوو گەورەو سەرداری دەمرێت یاخود سەفەر دەکاتو دەستبەرداری خزمەتکارەکەی دەبێت.

*ئەگەر ژنبێت مێردەکەی تەلاقیدەدات یاخود دەمرێت یان سەفەردەکات.

*ئەو گوێدرێژەی خاوەنەکەی نەناسراوە پیاوێکی نەزانو بێباوەڕە بەپێی ئایەتی: ﴿ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ ﴾ (لقمان: ١٩).

*هەروەها بەلگەیە لەسەر پیاوێکی جوولەکە بەپێی ئایەتی: ﴿ كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا ﴾ (الجمعة: ٥)، ئەگەر گوێدرێژەکە زەڕانی لەسەر مزگەوتێك یان بلندگۆیەکەوە بێباوەڕێك بانگەشەی بێباوەڕیدەکات، ئەگەر بانگیدا بەبانگی ئیسلام بێباوەڕێك موسوڵماندەبێت.

*ئەگەر بینی بوە بەخاوەنی گوێدرێژ تووشدەبێت بەدەستی کۆمەڵو گروهێکی نەزانەوە بەپێی ئایەتی: ﴿ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴾ (المدثر: ٥٠).

*ئەگەر سواری گوێدرێژێك بێتو بەباشی پێوەی بڕوات باپیرەی لەکاروکردەوەی رازییە.

*ئەگەر گۆشتی گوێدرێژ بخوات ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی گوێدرێژەکەی بەلێدان دەڕوات بەڕێوە بێبەشەو بەتەنیا بەنزاو پاڕانەوە نانو بژێوی پێدەدرێت.

*ئەگەر گوێدرێژەکەی چوە نێو لانەو ماڵەکەی باپیرەیەتی بەخێرو چاکەوە رووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی گوێدرێژەکەی بوە بەهێستر بژێوی لەلایەن فەرمانڕەواوە دەبێت، ئەگەر بوو بەدرندە بژێوی لەلایەن ستەمکارێکەوە دەبێت، ئەگەر بوو بەبەرانێك باپیرەیەتی رێزداریدەکات.

*ئەگەر بینی گوێدرێژەکەی هەلگرتووە هێزو توانایە خوداوەند پێیدەبەخشێ هەتا پێی سەرسامدەبێت.

*ئەگەر گوێی لەسمی ئاژەڵبێت بەبێنەوەی بیبینێ بارانو رێبازە.

*گوێدرێژ بۆ کەشتیارو موسافیر خێرە لەوەی هێواش بێتو نەجووڵێت.

*ئەگەر تەرسی گوێدرێژ کۆبکاتەوە ماڵو دارایی زیاددەکات، ئەگەر زۆرانبازی لەگەڵ گوێدرێژێکدا بکات هەندێك لەخزمە نزیکەکانی دەمرن.

*ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ گوێدرێژێکدا بکات بەهێز دەبێت لەسەر رێبازی باوباپیرانی.

*ئەگەر بینی گوێدرێژێك هاوسەرگیری لەگەڵکردوە ماڵو دارایی‌و جوانی بەئەندازەیەکی بێشومار زیاددەکات.
*گوێدرێژی رامو گوێڕایەڵ بێداری باپیرەی خەوبینەرە بۆ خێرو ماڵو دارایی.
*ئەگەر ببیێ بەخاوەن گوێدرێژێك یاخود بیبەستێتەوە یان بیخاتە نێو ماڵی خۆی خوداوەند خێرو چاکەیەکی بێشوماری پێدەبەخشێ‌و قوتاریدەکات لەغەم‌و پەژارە.
*ئەگەر لەسەر پشتی گوێدرێژەکەی بکەوێتە خوارەوە هەژار دەکەوێت، ئەگەر گوێدرێژەکە هی کەسێکیتر بێت‌و لەسەری بکەوێتە خوارەوە پەیوەندی نێوان خۆی‌و هاوەڵەکەی دەبچڕێ.
*ئەگەر گوێدرێژێك بکڕێ‌و نرخەکەی بدات بەدرهەم خێروچاکەی لەقسەوگوفتارەوە دەستدەکەوێت.
*ئەگەر گوێدرێژێکی چاوکوێر ببینێ ماڵو دارایی‌ەکی هەیە شوێن‌و جێی نازانێت، ئەوەی ناقۆڵاو نکوولی لێکراوە لەگوێدرێژدا دەنگییەتی، لەبنەڕەتدا باپیری مرۆڤو بەختیەتی.
*ماکەر ژن یان خزمەتکارێکی بەدخوو یان بازرگانی مرۆڤو شوێنی سوودو قازانجیەتی، ئەگەر لەخەودا لەژێریابوو دووگیانبوو لێی‌و منداڵیبوو بەچەشنێ رەگەزی ئەو قبوڵینەکات کوڕەکە هی ئەو نییە گەرنیشانەیەکی تێدابێت.
*ئەگەر لەشیری ماکەر بخواتەوە نەخۆشییەکی سووك دەگرێت‌و چاکدەبێتەوە.
*ئەگەر ماکەرەکەی جاشەکەرێکی نێرینەبێت منالی نێرینەی دەبێت ئەگەر مێینەبوو بەڵگەیە لەسەر خاوی‌و لەسەرخۆیی.
*هەروەها دەڵێن: ئەوەی سواری ماکەرێك ببێت بێئەوەی جاشەکەری لەگەڵدابێت ژنێکدەهێنێت بەبێئەوەی منداڵی هەبێت، ئەگەر گوێدرێژەکە جاشەکەری لەگەڵدابێت ژنێکی کوڕدار دەهێنێت.
*ئەگەر بینی دەستی جاشەکەیگرت یاخیبوو ترس‌وبیم رووی تێدەکات لەلایەن کوڕەکەیەوە، ئەگەر یاخینەبوو سوودو قازانجێکی هێواشی پێدەگات.
*هەروەها دەڵێن: ماکەر زیادبوونی ماڵو دارایی‌و پلەوپایەیە.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا منالە یا کوڕە یاخود ژنە ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەر یان زانست بەپێی ئایەتی: ﴿كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا﴾ (الجمعة: ٥).

* ئەوەی پێچەوانەی حاڵی بەئاگابوونی لەگوێدرێژەکەیدا بەدیبکاتو خەوبینەر لەخواترس بێت بەڵگەیە لەسەر خاوبوونەوەی بەندایەتی.
* دەگێڕنەوە (ذي النون) ی (میسری) (ڕەزای خوای لێبێت) گوتویەتی: من کاتێ سەرپێچی خوداوەند دەکەم ئەو حاڵوبارە لەگوێدرێژو خزمەتکارەکەمدا بەدیدەکەم.
* ئەگەر سواری ئاژەڵێکبوو کەشیاوینەبوو بەهۆی توێشوو پێداویستیەکانەوە ئەرکدەخاتە ئەستۆی یەکێك کەشایستەینەبێت.
* دەگونجێت گوێدرێژ بەڵگەبێت لەیەر بژێوی‌و رزق‌و ڕۆزی.
* گوێدرێژ بەڵگەیە لەسەر:
+زانایەك کارو کردەوە بەزانیارییەکەی نەکات.
+جوولەکە.
+ئەوەی مرۆڤ لەسەری دادەنیشێت.
* هێسترو خاوەنداریتی گوێدرێژ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر جوانکاری بەماڵو سامان.
* گوێدرێژ ژنێکی بژێوی پەیداکارەو خێرو بێری زۆرەو وەچەو نەوەی سوودو قازانجی پەیتا پەیتا هەیە.
* دەنگی گوێدرێژ بەڵگەیە لەسەر:
+شەڕو ناخۆشی.
+کوڕو منداڵی زینا.
+دەرکەوتنی جنۆکەو دروستکراوی پەنهان.
* هەروەها دەڵێن: بینینی دەنگی گوێدرێژ بەڵگەیە لەسەر تاریکایی.
* ئەگەر بینی بەباشی دەتوانێت سواری گوێدرێژ بێت یاخود دەترسێ لەوەی سواری ببێت، بەچەشنێکی جیاوازی خۆیدەردەخات.
* ئەگەر زانایەکی بینی سواری گوێدرێژبوە پلەوپایە بەدەستدەهێنێتو لەوانە وتنەوە دوا دەکەوێت.
* گوێدرێژی لەڕولاواز ماڵو دارایی‌و زیادبوونیەتی.
* گوێدرێژی قەڵەویش ماڵو داراییەکە تەواوبوەو کۆتایی هاتوە.
* گوێدرێژی (مەغریبی) باشترین جێنشینە.
* ماکەر ماڵو داراییەکە لەچاندنو کشتوکاڵ بەدەستیدەکەوێت.
* ئەگەر بینی سواری جاشەکەرێکبوە غەمو پەژارە ڕووی تێدەکات لەلایەن کوڕ یان ژنەوە.
* ئەگەر گوێدرێژەکەی بمرێت ماڵو دارایی زیاد دەکات، دابەزینیش لەسەر پشتی گوێدرێژو فرۆشتنی هەژارییە.

*ئەگەر بینی گوێدرێژێك سەر دەبڕێت تا گۆشتەكەی بخوات و رزق و رۆزی فراواندەبێت لەدوای تەنگەژەو نەداری.

*ئەگەر بینی گوێدرێژ بۆیەكێكیتر سەردەبڕێت خواردنی خراپدەبێت.

*ئەگەر بینی گوێدرێژەكەی چەن كلكێكی هەیە بەڵگەیە لەسەر رزق و رۆزی فراوان.

*ئەگەر بینی گوێدرێژێك یا چەن گوێدرێژێكی هەیە خۆشیی و شادی و خێروچاكەی زیاددەكات.

*گوێدرێژی كێویش بەڵگەیە لەسەر سەرپێچی.

*ئەگەر بینی سواری گوێدرێژێكی كێوی بووەو لەسەر پشتی دەكەوێتە خوارەوە باناگاداری سەرپێچی بێت.

**گوێدرێژەوان ( خاوەن گوێدرێژ ):**(ئیبن سیرین) دەڵێت: خاوەن ماڵی حەرامەو سەرچاوەی بژێوی نادروست و حەرامەو هانی خەڵكیدەدات لەسەر بەتاڵ و ناڕەوا.

(نابلسی)دەڵێت: خاوەنی گوێدرێژ بەڵگەیە لەسەر بەرپرسی كاروبار، بینینی بەڵگەیە لەسەر بژێوی بەهۆی سەفەرو گەڕانەوە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سووك و ئاسانكردنی كاروباری قورس و گران.

**گوێدرێژی كێوی:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: جیاوازی هەیە سەبارەت بەگوێدرێژی كێوی لەلێكدانەوەدا، هەندێكیان دەڵێن: پیاوێكە، ئەوەی ببینێ بەڵگەیە لەسەر دوژمنایەتی نێوان خەوبینەرو كەسێكی نادیار كەهیچ‌وپووچ و بەدرەچەڵەكە.

*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر ماڵ و دارایی، ئەوەی ببینێ گوێدرێژێكی كێوی لەدوورەوە ئەوە ماڵ و داراییەكی تیاچووی دەستدەكەوێتەوە.

*دەڵێن: سواربوونی گەڕانەوەیە بۆ ناحەقی و بەتاڵ و تێكدانی بەندی گوێڕایەڵی بۆ موسوڵمانان.

*ئەگەر گۆشتی گوێدرێژێكی كێوی خوارد یان شیرەكەی چەند خزمەتكارێكی دەستدەكەوێت لەلایەن پیاوێكی رێزدارەوە.

*شیری گوێدرێژی كێویش ماڵ و داراییەكەی رامكراوە.

*ئەگەر سواری گوێدرێژێكی كێوییبوو رام و گونجاوبوو بۆی سەریكردوەتە سەرپێچی، ئەگەر گوێدرێژەكە رامنەبوو زۆرانبازیدەكات لەگەڵی یاخود لێیدەدات ناڕەحەتی قورسی پێدەگات بەهۆی سەرپێچییەوەو غەم و پەژارە رووی تێدەكات.

* ئەگەر گوێدرێژەکە چوە ماڵەکەی پیاوێکی بەدوخراپی بێدین روودەکاتە ماڵەکەی، ئەگەر گوێدرێژەکەی بردە نێو ماڵەوەو لەدڵو دەرووندا وەك نێچیرێك بۆیدەروانی خێرو دەستکەوت روو لەماڵەکەیدەکات.

* ماکەری کێوی ژنە، خواردنی شیرەکەی خواناسیو رێنومایییە لەئایندا.

* ئەگەر بینی بوە بەخاوەنی گوێدرێژی کێویو رام ببێت بۆی قسەی بەسەر کۆمەڵو تاقمێکی پەرتەوازەی موسوڵمانانندا دەڕوات.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر گوێدرێژی ئاساییوو بەگوێدرێژی کێوی بەڵگەیە لەسەر زیان بۆی، ئەگەر گوێدرێژەکەی یەك کەڵەچاوبوو یا دییەی لاوازبوو کەمو کوڕی روودەکاتە بژێوی.

* ئەگەر بینی بوە بەگوێدرێژ بەلاو نەهامەتیەك رووی تێدەکات ئەقڵو ژیری تێکدەداتو کردارەکانی کەم خێر دەبێت.

* ئەگەر گوێدرێژێکی بینی لەئاسمانەوە دابەزیوەتە خوارەوەو عەورەتی چوە بەنێو پاشیدا ماڵو دارایی بێشوماری دەستگیردەبێتو پێی دەوڵەمەنددەبێ بەتایبەت ئەگەر پادشاو فەرمانڕەوابوو.

* هەروەها گوێدرێژی کێوی بەڵگەیە لەسەر:

+هاوسەر یاخود منداڵ.

+کەسانی دڵڕەقو توندوتیژ.

+کەسانی دەشتەکیو گوندنشین.

* هەروەها مانگای کێویش وایە بەلام پتر بەسۆزە لەگوێدرێژی کێوی.

**گوێرەکە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کوڕێکی نێرینەیە ئەگەر بەشاخەوەبوو یان پێیبەخشرا، هەموو بەچکەیەکی ئاژەڵانی تریش هەر بەوشێوەیە ئەگەر پێی ببەخشرێ.

* گوێرەکەی سوورەوەکراو دڵنیاییە لەترسوبیم بەپێی چیرۆکەکەی حەزرەتی (ئیبراهیم) (سەلامی خوای لێبێت).

* گوێرەکە کوڕێکە شایستەی خێرە، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارەو سەرپێچیو دەرچوون لەگوێڕایەڵی خوداوەند.

* ئەگەر ژنێك بینی بەخشڵی زێڕەوە یان بەجلوبەرگەوە بەڵگەیە لەسەر خۆشیو شادی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر فیتنە.

* گوێرەکەی قەڵەو مژدەیە بەبوونی کوڕو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا .

* ئەگەر بینی گۆشتی گوێرەکە دەخوات ماڵو دارایی لەپیاوێن بەدەستدەهێنێ، ئەگەر بینی گوێرەکەیەکی هەڵگرتو بردی بۆ ماڵی خۆیان غەمو پەژارەیەکی قووڵ رووی تێدەکات.

**گوێز:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گوێزی هندی: نێرگەلەیە، هەندێکدەڵێن: ماڵو داراییەکە لەلای پیاوێکی فالگەری بەئەستێرە، ئەگەربینی گوێزی هندی دەخوات زانیاری ئەستێرەگەری فێردەبێت یاخود دوای رای ئەستێرەگەرێك دەکەوێت لەراوبۆچووندا و بڕوای پێدەکات، هەروەها ئەگەر بینی بوە بەکاهین یاخود ئەستێرەگەر بەبێداریو بەئاگایی گوێزی هندی بەدەستدەهێنێت.

(نابلسی)دەڵێت: ماڵو داراییەکی پەسمەندەکراوە، ئەگەر خشەخشی هەبوو ناکۆکیو دەنگەدەنگو قاووقیژە.

* دارگوێز پیاوێکی عەجەمی رەزیلو چرووکو ورەوركارەو خاوەن ماڵو داراییەکی کتوپڕەو خێری لێناکات.

* ئەگەربینی لەسەر داگوێزێکە وابەستەی پیاوێکی عەجەمی گەورە دەبێت بەپێی پیاهەڵدانی خۆی.

* ئەگەر لەسەر دارگوێزەکە هاتەخوارەوە نێوانیان یەکناگرێو نابەسترێ، ئەگەر کەوتەخوارەوە لەسەریو مرد لەبەردەم پیاوێکی کەتەولی لەشولار گەورەدا دەکوژرێت یان لەبەردەم پادشایەك، ئەگەر درەختەکە شکا پیاوە لەشولارگەورەکە دەمرێتو ئەوەی دەکەوێتەخوارەوە دەبێت بەفەرمانڕەوا ئەگەر نەمرێت قوتاردەبێت، ئەگەر هەردوودەستو قاچی شکا روو بەتیاچوونو هیلاکی دەچێتو بەڵاو نەهامەتیەکی گەورە رووی تێدەکات بەڵام لەدواییدا قوتاردەبێت.

* ئەگەربینی دارگوێزێك دەبڕێتەوە پیاوێکی عەجەمی دەکوژێت.

* ئەگەر گوێزی لەباخێك لێکردەوە لەماڵو دارایی لەلای ژنێکەوە بەدەستدەکەوێت ئەگەر گوێزەکە پاككرابوو رزقو رۆزی تەواوە.

* ئەگەر توێکڵی گوێزی خوارد غەیبەتی پیاوێکی رەزیلو چرووکدەکات، ئەگەر ئەو توێکڵە ژنێك بڵاویکردەوە غەیبەتی پیاوێکی رەزیلو چرووك دەکات.

* ئەگەربینی وەك ئەوەی یاری بەگوێزدەکات لەماڵی حەرامدا رۆدەچێت.

*گـوێزی پـاككراویش رزق و رۆزییـه، هـەروەها دەچـوێنرێ بەپیاوچـاكان و سەركردەو برایان.
*هـەروەها دەچـوێنرێ بەلەشساغی و درێژەكێشانی سەفەر.
*ئەگەرخەوبینەر ژنبوو گوێز بەڵگەیە لەسـەر تەمەندرێـژی لەگـەڵ مێـردو هاوسـەر بـەهۆی واژووبـوونی پێتەكانیـەوەو دروسـتی كاروبـاری قورس و گران و ئەستەم.
*گـوێزی شـكاو ماڵ وداراییـە بەبێماندوبوون.
*گوێزی هندی بەڵگەیە لەسەر گوفتاری كامینەكان، ئەگەربینی گوێز دەخوات گوتەی راست و دروستدەبێت.
**گـوێگر**:(نابلسی) دەڵێـت: گـوێگرتن لەقورئان یان گـوێگرتن بۆ پیاهەڵدانی پێغەمبـەر (ﷺ) یـان گـوێگرتن لـەوتار بەڵگەیە لەسەر رێنومای و گەڕانـەوە بۆ لای خـوداو پاشـگەزبوونەوە، ئەگـەر گوێبیـستی بـەدەر لـەوە بـوو ئـەوە دەچـێتەریزی ئەوانـەی خوداوەنـد دەربارەیـان دەفـەرموێت: ﴿ وَاِنْ تَـدْعُوهُمْ اِلى الْهُـدَى لاَ يَـسْمَعُوا﴾ (الأعـراف: ١٩٨). گـوێگرتنیش درۆو فیتنەیە، دەگونجێت گوێگر نارەحەتی و بەڵاو نەهامەتیەك بێتە رێی.

*ئەگـەر بینـی گوێـدەگرێ ئەگـەر بازرگـانبوو گرێبەسـتەكەی هەڵدەوەشێنێ، ئەگەر فەرمانڕەوابێت لادەبرێت.
*ئەگەر بینینی گوێی لەمرۆڤێك گرتـوە بەنهێنی دەیەوێت ئابڕووی ببات.
*ئەگەر بینی گوێی لەوتی وتی گرتـوەو شوێنی باشترین وتە دەكـەوێت مـژدەی پێدەدرێت.
*ئەگـەر بینـی گوێـدەگرێ و خـۆی بەچەشـنێك لێـدەكات و گـوێی لێنییـە ئەوە درۆدەكات و رادێت لەسەرئەوەی، هـەروەها گوێبیـستبوونی دەنگـەكان لەخەودا یاخود پێدانی ئـەوەی شیاوی خەوبینەرە بەم چەشنەیە:
+ **قاووقیژی نـەوەی (ئـادەم)**: رزق و رۆزی و سوودو قازانجە.
+ **دەنگی ئاژەڵ**: غەم وپەژارەو ترس و بیمە.
+ **سـەگوەڕ**: گوتـەو خۆهەڵقورتانـە لەكارێكدا هیچ كەڵكناگرێ.
+ **مرەی پڵنگ**: خۆنواندن و نـازكردن و پێنەزانینە.
+ **گمەگمی كـۆتر**: شـیوەن یـاخود مارەبڕینە.

+**دەنگی پەڕەسێلکە:** قسەو وتەی بەسوودە یاخود گوێگرتنە لەقورئانی پیرۆز.

+**دەنگی بۆق:** لێدانە یان دەنگی زەنگە.

+**فیشکەی مار:** جەنگاندنو ئاگاداریو دەمەدەمەیە.

+**زەڕەی گوێدرێژ:** دوعاکردنە لەستەمکاران.

+**ڕەزیل بەخیل:** گوتەو خۆخستنە نێو گومانەوەیە.

+**بۆڕەی گوێرەکە:** فیتنەو ئاشوبە.

+**دەنگی حوشتر:** سەفەرەو ماندوبوونە.

+**نەڕەی شێر:** هەڕەشەلێکردنە.

+**مرەی پشیلە:** فیتنەیو دەنگەدەنگە لەگەڵ چاوداگرتنو فروفێڵ.

+**دەنگی مشك:** کۆبوونەوەو خۆشەویستیو رزقو رۆزییە.

+**دەنگی ئاسك:** ئالوودەو بیرکردنی نیشتمانە.

+**لورەی گورگ:** ئاگاداری دزییە.

+**دەنگی ڕێوی:** ئاگادارییە بەهەڵهاتنو گواستنەوە.

+**دەنگی چەقەڵ:** کاروباری گرنگە لەشەڕو چاکەدا.

*‌**گوێگرانی مرۆڤ:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر سەرسامیو جیاوازیو پەرتەوازەی یان درۆکردن لەگەڵی.

**گوێهەڵخستن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گوێ هەڵخستن لەخەودا بریتییە لەدرۆو قسەهەڵبەستن، بەپێی فەرمایشتی خوداوەند ﴿يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ﴾(الشعراء: ٢٢٣).

واپێویست دەکات گوێ هەڵخستن لەلایەن فەرمانڕەواوە کارێکی ناشیاوو گونجاو بێت بەپێی ئایەتی ﴿إِلَّا مَنْ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُبِينٌ﴾(الحجر:١٨).

* سەبارەت بەگوێهەڵخستن : ئەوەی لەخەودا ببینێ گوێی هەڵخستوە ئەگەر بازرگانبوو پەشیمان دەبێتەوە لەگرێبەستو پەیمان، ئەگەر فەرمانڕەوا بێت لەکاردەخرێ بەپێی ئایەتی: ﴿إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾(الشعراء:٢١٢).

* ئەگەر خۆی بینی گوێی گرتوە لەیەکێك دەیەوێت ئابرووی بباتو نهێنی ئاشکرا بکات.

* ئەوەی ببینێ گوێ بۆ وتیو قسەی ئەمو ئەو رادێریو شوێنی باشەکانی دەکەوێت مژدەی پێدەدرێت بەپێی ئایەتی : ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ، الَّذِينَ

يَستَمِعُونَ القَولَ فَيَتَّبِعُونَ أَحسَنَهُ ﴾(الزمر: ١٧-١٩).

*ئەگەر بینی گوێی هەڵخستبوو بەلام خۆی وانیشاندەدا گوێی لێنییە راستناکات‌و بەر ئایەتی: ﴿يَسمَعُ آيَاتِ اللهِ تُتلَى عَلَيهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُستَكبِراً كَأَن لَم يَسمَعهَا فَبَشِّرهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ (الجاثية: ٨)

## گ وو

**گووژاڵك (كوژاك)**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: داری گوژالك پیاوێكی ترسنۆكی تۆقیوی بێدینەو خوای گەورە بەپیس‌و گەندەڵ ناوزەدیكردوەو بەچەشنێ باسیدەكات جێگیربوونی نییەو دەفەرموێت: ﴿كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجتُثَّت مِن فَوقِ الأَرضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ﴾ (ابراهیم: ٢٦) بەروبوومەكەشی غەم‌و پەژارەیە.

## گ ۆ

**گۆچان(گالۆك)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: گۆچان كوڕێكی خێراو تیژتێپەڕە، هەروەها دەڵێن: پیاوێكی دووڕووی شەلەو یاریكردن پێی هانابردنە بۆ پیاوێك ئەوە سیفەتی بێت.

*هەروەها دەڵێن: باش نییە لەخەودا بەپێی ئایەتی: ﴿أَفَأَمِنُوا أَن تَأتِيَهُم غَاشِيَةٌ مِن عَذَابِ اللهِ﴾ (یوسف:١٠٧).

(نابلسی) دەڵێت: گۆچان زمانێتی یاری پێدەكات ویست‌و خواز لێكدەدرێتەوە، ئەوەی تێدا روودەدات لەزیادوكەم بیگەڕێنەوە بۆ كوڕ یا زوبان.

*ئەگەر بینی بەگۆچان لەتۆپێكدەدات شەڕ لەگەڵ هاوسەرەكەی دەكات یان لەگەڵ پیاوێكی دووڕوو چونكە تۆپ هەركات بوەستێ دیسان ماندوویدەكات‌و لێیدەداتەوە، ئەمەش لەشەڕو پێكداداندەچێت.

*وشەی گۆچان لەوشەی(جان)ەوە هاتوە دەگونجێت بینینی بەلگەبێت لەسەر جەنگ‌و زوبان.

*هەروەها بینینی بەلگەیە لەسەر خێرێكی گوزەراو لەرابردوودا.

*ئەگەر بینی گۆچانێكی بەدەستەوەیەو لێدەدات خوازەكانی دەستگیردەبێت بەبێنەوەی جێگیر بووبێت‌و بەئەندازەی زاڵبوونی بەسەر لێداندا بەدەستیدەهێنێت.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: گۆچان پیاوێكی پارێزراوی دووڕوە، ئەگەر بینی گۆچانێكی بەدەستەوەیە پەنادەگرێ بەپیاوێك ئەو سیفەتەی هەلگرتوەو ئەوەی كەوا خوازیاریەتی

بەدەستیدەهێنێت‌و بەسەر دوژمناندا زاڵدەبیٚ‌و ماڵ‌و دارایی زیاد دەکات.
*ئەگەر گۆچانەکەی بەنوشتاوەیی بینی‌و خۆیدابوو بەسەریا ماڵ‌و سامانی دەڕوات‌و ئەوەش لەخەڵکی وندەبیٚ، ئەگەر بینی شکا ئەگەر بازرگانبوو بازرگانیەکەی زەرەدەکات، ئەگەر فەرمانڕەوابوو لادەبرێت.
*ئەگەر بینی بەگۆچانەکەی کێشای بەزەویەکدا کێشەو گرفتی تێدابوو دەبێت بەخاوەنی ئەو زەوییەو نەیارەکانی دەشکێنیٚ.
*ئەگەر بینی خۆیبوە بەگۆچان بەخێرایی‌و کتوپڕ دەمریٚ.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی گۆچانەکەی شکا نەخۆشیەکی سەخت‌و توندەگریٚ‌و هێزو توانای لەبەردەبڕێت.
*ئەگەر بینی بەگۆچانەوە دەڕوات بەڕێوە سوورە لەسەر سواربوونی کەشتی.
*گۆچان بەڵگەیە لەسەر:
+فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە.
+سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا.
+گەیشتن بەهیواو ئاوات.

*ئەگەر گۆچانەکە لەبادەمبوو بەڵگەیە لەسەر بەسەرچوونی ئەوەی خێروشەڕی تێدایە.
*ئەگەر لەقۆخبوو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دووڕوویی لەئایندا.
*دەگونجێت گۆچان بەڵگەبێت لەسەر مار یان جادوو.
*ئەگەر بینی لەکەسێکدەدات بەگۆچان زماندرێژیدەکات بەسەریا.
*ئەگەر گۆچانەکەی کێشا بەبەردێکدا ئاوی لێدەرهێنا ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەنددەبێت، ئەگەر دەوڵەمەندبوو پتر دەوڵەمەند دەبیٚ، دەگونجێت رزق‌و رۆزییەکی باشبێت.
*دەگونجێت گۆچان پیاوێکی گەندەڵ‌و پیس‌و بیٚ ئاین بێت چونکە لەدار دروستکراوەو ئەوەش پیاوێکی دووڕووە.
**گۆرانی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر گۆرانیەکە خۆشبوو بەڵگەیە لەسەر بازرگانیەکی بەسوود ، ئەگەر باشنەبوو بەڵگەیە لەسەر بازرگانیەکی زەرەرمەند.
*هەندێکدەڵێن: گۆرانیبێژ زاناو دانایە یان یادخەرەوەیە.

*گۆرانی لەبازاڕدا ئابڕوچوونە یاخود کاروباری ناقۆڵآیە دەکەونە نێوی، بۆ هەژاریش ژیری و ئەقڵ لەدەستدانە.

*ئەگەر شوێنێکی بینی گۆرانی تیا دەگوت لەوشوێنەدا درۆ روودەدات و جیاوازی دەکەوێتەوە نێوان خۆشەویستان و پلانی ئیرەییبەرە.

*هەروەها دەڵێن: گۆرانی بەڵگەیە لەسەر قاووقیژو گێرمەوکێشمە بەهۆی جیاوازی جموجووڵی سەماوە.

*ئەگەر بینی هۆنراوەیکردوە بەگۆرانی بەدەنگێکی خۆش و بەرز خێرە بۆ گۆرانیبێژان و سەرجەم ئەوانەی لەوێن.

*ئەگەر بینی گۆرانییەکی ناخۆشی وت بەڵگەیە لەسەر بێکاریی و رسوایی.

*ئەگەر بینی لەنێو قوڕدا دەڕواو گۆرانی دەڵێت: خێرە بەتایبەت ئەگەر خورمای فرۆشت.

*گۆرانیبێژی حەمام قسەو قسەی تاوانبارە.

*هەروەها دەڵێن: گۆرانی لەبنەڕەتدا بەڵگەیە لەسەر شەڕو ئاژاوەو دەنگەدەنگە.

*گۆرانی و لاواندنەوە بەلاّونەهامەتییە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەحەمامدا گۆرانی وت لەبازاڕدا بەخواناس ناسرابوو ئامادەی فیتنەدەبێ کەروودەدات و دەکەوێتەوە.

*گۆرانی ملکەچ و رسوایان لەبازاڕدا بەڵگەیە لەسەر ئەقڵ و سووکیان.

**گۆرانیبێژ:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودات بینینی بەڵگەیە لەسەر شادی و خۆشی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەرو گواستنەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر. دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئامۆژگاریکار.

**گۆرەویی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گۆرەویی ماڵ‌ودارایی و پارێزەرە بۆی، ئەگەر بۆنیخۆشبوو بەڵگەیە لەسەرنەوەی خاوەنەکەی ماڵ و داراییەکەی دەپارێزێ بەزەکات و بەباشی باسدەکرێ، ئەگەر بۆنەکەی ناخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر ناقۆڵآیی ژن، ئەگەر پڕوکاوکۆنبوو بەڵگەیە لەسەر ڕێگری لەزەکات و خێر.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی گۆرەویی لەپێدەکات ماڵ و داراییەکەی هاوسەنگ دەبێت ئەگەر دایکی مابوو کۆچی پێدەکات، وەگەرنا کوڕەکەی یاساغدەبێت.

*هەروەها گۆرەویی بەخزمەتکارو ژن و بەردەست ناوزەدکراوە.

**گۆڕ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گۆڕی هەڵکەنراو زیندانە هەروەك چۆن زیندانیش گۆڕە.

* ئەگەر بینی دەچێت بۆسەردانی گۆڕستان سەردانی زینداندەکات.

* ئەگەر بینی گۆڕێك هەڵدەکەنێ لەسەربانێك تەمەندرێژ دەبێ.

* کۆمەڵە گۆڕێکی زۆر لەشوێنێکی نادیاردا بەڵگەیە لەسەر پیاوانی دووڕوو.

* ئەگەر بینی گۆڕستان بارانی لێباری خەڵکی سۆزو بەزەییان بەسەرادەبارێ.

* ئەگەر گۆڕێکی لەشوێنێکی نادیار بینی تێکەڵ بەپیاوێکی دووڕوو دەبێت.

* گۆڕستانی ناسراو بەڵگەیە لەسەر کارێکی حەق کەئەو لێی بێئاگایە.

* ئەگەر بینی گۆڕ بۆ خۆی هەڵدەکەنێ لانەو ماڵێك بۆ خۆی دروستدەکات.

* ئەگەر بینی گۆڕی مردوویەك گوێزراوەتەوە بۆ ماڵەکەی یان گەڕەك و شارەکەی منداڵەکانی لەو شوێنەدا ماڵێك دروستدەکەن.

* ئەگەر بینی چوە نێو گۆڕێك بەبێئەوەی تەرمو جەنازەبێ ماڵێکی بەتاڵدەکرێ.

* ئەگەر بینی لەسەر لێواری گۆڕێك وەستاوە گوناهێك ئەنجامدەدات بەپێی ئایەتی: ﴿وَلاَ تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ﴾ (التوبة: ٨٤).

* ئەگەر پیاوێکی دەوڵەمەندی لەگۆڕستان بینی بەدەوری گۆڕەکاندا دەهاتو دەچوو سەلامی لێدەکات، هەروەها دەڵێن: بێپارە دەبێو دەست لەخەڵکی پاندەکاتەوە چونکە گۆڕستان شوێنی بێپارەیانە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا زیندانەو زیندانیش گۆڕستانە، ئەگەر بینی لەگۆڕستان نیشتەجێبوەو هێشتا هەر زیندوە زیندانی دەکرێ.

* ئەگەر گۆڕی هەڵکەندو ڕەبەنبوو ژنێکدەهێنێ بەفرۆفێڵ.

* ئەگەر گۆڕێکی لەسەر زەوی هەڵکەندو دیواری نەبوو لانەی قیامەتە ئەگەر چوە نێوی ئەجەلی هاتوە، ئەگەر نەچوە نێوی هیچی تێدا نییە.

* ئەگەر گۆڕێکی کڕیو نەچوەنێوی ژنێکدەهێنێ.

* ئەگەر گۆڕێکی کڕیو نەچوە نێوی ژنێکدەهێنێ.

* ئەگەر گۆڕێکی بینی لەشوێنێکەوە گوێزرایەوە بۆ شوێنێکیتر کەسێك لەجێنشینەکانی خاوەنی ئەو گۆڕە لانەو ماڵێك دروستدەکات.

*گـۆڕی نادیـار نەتـەوەو کۆمـەڵێکی دووڕوون بـەپێی ئایـەتی: ﴿ وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَنْ فِي الْقُبُورِ ﴾ (فاطر: ٢٢).

*ئەگـەر گـۆڕێکی هەڵکەنـد هاوسـەردەگرێ، ئەگـەر کـردی بـەماڵی خۆی زۆر باسی مردندەکات.

*گۆڕ بەڵگەیە لەسـەر سـەفەری دووروو بێزاریو هاوسەرو زیندان.

*ئەگـەر بینـی گۆڕێـك پڕدەکاتـەوە تەمەنیدرێژدەبیّو لەشساغدەبیّ.

*ئەگەر بینی لەگۆڕێکدا ئەسپەردەکرا بەبێئـەوەی بمـریّ غـەمو پـەژارە ڕووی تێدەکات یاخود تەنگەشەو گرفـت دێت بەسەریا یاخود زینداندەکریّ.

*ئەگـەر خـۆی بـەکفنکراویو ئەسـپەردەکراوی بینـی لەگۆڕەکەیـداو زیندوبوو ژندەهێنیّ.

*ئەگـەر گـۆڕی مردوویـەکی هەڵدایـەوە خوازیـاری ڕێگەیەکـەو شـوێنی ڕێبـازی مردوەکـە دەکـەویّ، ئەگـەر مردوەکـە زانابێت زانیارییـەو بەدەستیدەهێنێت، ئەگـەر دەوڵەمەنـدبوو مـاڵو سـامان بەدەسـتدەهێنیّ، ئەگـەر چـوەنێو گۆڕەکەیو بەزینـدوێتی بـەدیکرد مـاڵو دارییە حەرامـە، ئـەو زانیـاریو داناییـە ڕاستە، ئەگەر بەمردوویی بینی داواکەی دەستگیرنابیّ.

*ئەگەر بینـی گـۆڕی پێغەمبـەری (ﷺ) هەڵدایـەوە سـوننەتی ئـەو زیندودەکاتەوە.

*ئەگەر مـردووی بینـی لەگۆڕەکانیانـدا هەسـتاونو گەڕانـەوە بـۆ ماڵیـان بەبێئـەوەی کـەس بیانناسـێتەوە لەمزگـەوت دێتـەدەرەوەو جێنـشینانی شـار گەرچـی هاوەڵپەیـداکارن پـارێزراو دەبـن، یـاخود کـشتوکاڵی خـەڵکی سـەوزدەبێت کەپێـشتر ناهومێـدبوون لێی.

*ئەگەر گـۆڕی بێباوەڕێکی هەڵدایـەوە یـا بیدعـەکاریّ یـان کەسـێکی ناموسوڵمان دوای ڕێبازی سـەرگەردانی دەکـەوێت یـاخود مـاڵو داراییـەکی بەحـەرامو فرۆفێـڵ چارەسـەردەکات، ئەگەر هەڵکەندنەکە بـەردەوامبوو هـەتا گەیـشت بەکـەلاکێکی بۆگـەن یـاخود سـووتاو پیـساییەکی زۆرو بێـشومار ئەوجا لەبەڵگەهێنانـەوەدا بـەهێزدەبیّو دەگات بەدەرەنجامی خراپی خۆی.

**گۆڕستان:** (نابلسی)دەڵێت: لەخـەودا بەڵگەیە لەسەر:

+ئامۆژگاری.

+خوێندنەوە.

+گریان.

+بیرخستنەوە.
+ملکەچیو پشت لەدنیاکردن.
+زانایان.
+خواناسان.
+فەرمانڕەوایانی پادشا.
+سەرکردەکانی سوپا لەباوەڕداران.
+ئامادەکردنی چادرەکانیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازانی دوژمن.
+کۆبوونەوەی ژنو پیاو بۆ کاروباری گرنگو پێویست.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لانەو ماڵی داوێنپیس.
*گۆڕستانی خەڵکی ناموسوڵمان بەڵگەیە لەسەر:
+بیدعە.
+بێئاگایی.
+مەی.
+زیناوخراپ.
+بێباوەڕیو ترسوبیم.
+تالانی.
+دەرخستنی نهێنیو چاو هەڵهێنان بەعەورەتو ناتەواوی موشریکو دووڕوان.
*ئەگەر لەگڵکۆی ئەوانە شتێکی ئاوا ببینێ بەڵگەیە لەسەر رزقو ڕۆزی حەلاڵ لەکاسبی یان دەستکەوت.

**گۆڕەپانی سوارچاکان:**
(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر چوستو چالاکیو سەرکەوتن بەسەر دوژمنانو ئاگادارییە بۆ منداڵان یان پیشەسازی بۆیەکێك ببینێ.

**گۆڕهەڵکەن:** (ئیبن سیرین)دەڵێت قوتابیو زانستخوازە بەڵام نادیارە، ئەگەر شایستەی زانیاری نەبوو دەویتە. هەروەها بەڵگەیە لەسەرئەوەی بەدووی کاروباری نهێنیدا دەگەڕێ.
*ئەگەر مردوەکانی گواستەوە دەگات بەوەی حەزی پێدەکات.
*ئەگەر گۆڕی مردوویەکی هەڵدایەوە بەدووی زانیاریەکدا دەگەڕێت لەبۆ بەدەستخستنی دنیا، ئەگەر ماڵو سامانبوو حەرامە ئەگەر مردوەکە زیندوبوو ئەوجا زانیاری زیادبوونی ئاینەکەیەتی گەرماڵبوو حەلالە.
*ئەگەربینی لەگەڵ مردوویەك دەدویێ لەبۆ بەدەستخستنی پێداویستیەکانی پێداویستیەکانی بەدەستدەهێنێ.
(نابلسی)دەڵێت: دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چوونە نێو ماڵی بێباوەڕو بیدعەکاران.

*ئەگەربینی گۆڕهەڵدەداتەوەو مردوو دەرناهێنێ دەرووی لێدەکرێتەوەو مژدەی دەدرێتێ.

**گۆرهەڵکەنە**:(ئیبن سیرین)دەڵێت: پیاوێکی ستەمکاری دڵڕەق و بێسۆزو بەزەییە، هەرکەس لەخەودا بیبینێ دەچێتە ماڵی وەك پشیلە وایە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەوەی کێشمەکێشی لەگەڵ بکات کێشمەکێش لەگەڵ مرۆڤێکی لەو جۆرەدا دەکات، هەروەها لەخەودا گۆرهەڵکەنە یان پشکنەرە.

**گۆڕینەوە( شتبەشت )**: (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر گۆڕینەوەیکرد لەخەودا دەستیەتی و وەلأمدانەوەیەو شتێکی باشتری پێدەدرێ لەدنیاو قیامەتدا.

**گۆڕینی ناو**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی بەناوێکیتر بانگدەکرێت ناوەکە ناقۆڵایە خەوش و کەموکوڕی تێدا دیاری دەدات یان نەخۆشییەکی خراپ، خۆئەگەر بەناوێکی باش بانگکرا وەك(محەمەد) یا(عەلی) یا (حەسەن) یان (سەعید) ڕێزو شکۆ بەدەستدەهێنێت بەپێی مانای ناوەکە.

**گۆزە**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی بەتوانای بڕیار سەپێنەرەو ئەزموونی دەستەلأتی هەیە ئەگەر ئاوی لێرژا دەبێت بەفەرمانڕەواوکاربەدەست، وەگەرنا ئەوا لەکاردەخرێت.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم لەگۆزەیەکی سەرباریکدا ئاو دەخۆمەوە، ئەویش پێی وت: تەنگت بەکیژێك هەڵچنیوەو زۆرت بۆ هێناوە.

*هەروەها لە(ئیبن سیرین)یان پرسی ئەگەر پیاوێك گۆزەیەك هەڵبگرێ و پەتێکی تێبکات و شۆڕیبکاتەوە بۆ ناوبیرێك کاتێ پڕئاوبوو پەتەکە بپچڕێ و گۆزەکەش بەربێتەوە خوارەوە، ئەویش لەلێکدانەوەی ئەم خەوەدا وتی: پەتەکە پەیمان و بەڵێنەو گۆزەکەش ئافرەتەو ئاویش فیتنەیەو بیریش خراپەیە، ئەوپیاوەش لەلایەن هاوڕێیەکیەوە نێردراوە بۆئەوەی ژنێکی بۆ دەستنیشان بکات بەلأم ناپاکی لەگەڵکردوەو بۆخۆی دەستنیشانکردوە، پاشان مارەی بڕیوەو کردوویەتی بەهاوسەری خۆی.

*هەروەها پیاوێکیتر هات بۆلای و پێی وت: لەخەودا بینیم گۆزەیەك بەسەر شانمەوەیەو لەناکاو شکا بەلأم ئاوەکەمایەوە، ئەویش وتی: ئاخۆ ژنەکەت دووگیان نییە؟ وتی: بەڵێ،

وتـی: خـۆی دەمرێـتو منالەکـەی دەمێنێت.
(نابلسی) دەلێت: لەخـەودا کـچ یـان خزمـەتکارە ، کۆمەلـە گۆزەیـەك کـچو خزمـەتکاری ئامـادەی هاوسـەرگیرین، ئـەوەی لێیبخواتـەوە مـالو سـامانی لەدوولاوە دەستگیر دەبێ.
*ئەگـەر بینـی شـکاوە مـەرگی کـچو خزمەتکارانە.
**گۆزەلـە**: (ئـیبن سـیرین)دەلێـت: بەکرێگیراوێکی دووڕوەو لەسەردەستی ئەودا مـالو دارایی بەدەستدەکەوێتو خواردنـەوەی ئـاو تێـدا مـالو دارایـی حەرام یان ژنێکی خۆشنوودە.
*ئەگـەر بینـی نیـوەی خواردوەتـەوە نیوەی تەمەنی لەدەستدەدات ، ئەگـەر کەمتر یا زیاتر بخواتەوە لێکدانەوەکەی بەوچەشـنەیە ئـەوەی بەسەرچـوە یـان مـاوە لەتەمـەنی، بـەم پێیـە سـەرجەم دەفرەکان لێکدەدرێتەوە.
*گۆزەلـە ژن یـان خزمـەتکار یـاخود کۆیلەیە یا خزمەتکار.
*دەگونجێت ئەگـەر پڕبێت بەلگـەبێت لەسەر زەیت یان هـەنگوین یـا شـیر بۆ خەلکی دنیا.

(نابلـسی)دەلێـت: ئەگـەربینی لەکۆزەلەیـەکی دەم باریـك ئـاو دەخواتەوە تەنگ بەکیژێك هەلدەچنێ، ئەگەربینی گۆزەلەیەکی بەسەر شانەوە هـەلگرتووە گەریکەوێتـە خـوارەوەو بـشکێ بـەلام ئاوەکـەی بمێنێتـەوە ژنەکـەی دووگیانـدەبێتو دەمرێـتو کوڕەکەی دەمێنێتەوە.
*بینینی گۆزەلە بەلگەیە لەسەر ئاژەل یـان هاوسـەرێك زۆر خۆی مانـدوبکاتو رەنجبدات مەگەر گۆزەلەکە مـس بێـت ئـەوجا بەلگەیـە لەسـەر ژنێکـی پلەوپایەبەرز.
*گۆزەلەی مەیو بادە بەلگەیە لەسـەر ژنێـك لـەخولی مانگانـەدابێت ، ئـەوەی لەو گۆزەلەیە ئاوبخواتەوە دەچێتە لای ژنێك لەخولی مانگانەدابێت.
**گۆشت**: (ئـیبن سـیرین)دەلێـت: گۆشـت نەخۆشـیو ئێشوئـازارەو کڕینـی بـەلاو نەهامەتییـە، گۆشـتی تـازەش مردنـەو خـواردنی غەیبـەتکردنی ئەوپیاوەیـە کەئاژەلەکەی دەدرێتەپال.
*خوێ لەگەل گۆشتی مەڕ ئەگەر خرایە سـەر ئـاگر خێـرە روو لەخانەوادەکـەی دەکـات، دوای بـەلاو نەهامـەتییو، بەئەندازەی خۆیو، قەلەویش باشـترە لەلاوازیو لەڕی.

*ئەگەر بەبێ گۆشتی مەڕبوو کەسێکە باسی نەماوە.
*هەروەها دەڵێن: گۆشتی لاواز پیاوێکی هەژارە یان زەرەرو گۆشتی وشکەوەبووش دەستکەوتە لەباسکردنی مردواندا.
*ئەگەر گۆشتێکی لەڕی سوێری خوارد ماڵوداراییی کەمدەکات.
*گۆشتی حوشتر ماڵو دارابییەکە لەلایەن دژمنێکی گەورەی بەهێزەوە بەدەستیدەهێنێ بەمەرجێ خەوبینەر دەستی لێنەدات، ئەگەر دەستی لێدا لەلایەن پیاوێکی گەورەو دوژمنێکی بەهێزەوەیە، ئەگەر بەلێنراوی خواردی ماڵ سامانی پیاوێکدەخواتو نەخۆشدەکەوێو پاشان چاکدەبێتەوە.
*هەروەها دەڵێن: ئەوەی بیخوات سوودو قازانج لەدەستەلاتدار دەکات.
*گۆشتی مانگا بەلگەیە لەسەر ماندوبوون چونکە بەهێواشی هەرسدەبێت، هەروەها بەلگەیە لەسەر کەمی ئیش‌وکار بەهۆی جیرپییەوە.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر گۆشتی مانگا سووروەکراوبوو دڵنیاییە لەترس‌وبیم، ئەگەر خەوبینەر ژنێکی دووگیانبوو کوڕێکی دەبێ بەپێی ئایەتی: ﴿جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ﴾(هود:٦٩)هەتا کۆتایی چیرۆکەکە.
*هەموو شتێك ئاگری بەربکەوێ لەکاتی بێداریدا لەخەودا رزق‌و رۆزییە گوناهی تێکەڵبوە.
*ئەگەر لەخەودا بینی گۆشتی گا دەخوات دەبرێتە بەردەم دادوەرێك، گوێرەکەی قەڵەو مژدەیەکی گەورەی خێرایەو مژدەکەش بەپێی قەڵەوییەتی، هەروەها دەڵێن: رزق‌و رۆزی‌و فەڕو پیتە لەگەڵ قوتاربوون لەترس‌وبیم.
*گۆشتی لێنراوی مانگا رێزێکی کەمە لەخەوبینەر هەتا واباشە سوپاسگوزاری خودای تێدا ئەنجامبدات: ﴿وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وقُدرور راسيات اعملوا آل داود شكراً﴾ (سبأ:١٣).
*گۆشتی مەڕ ئەگەر سووروەکراوبوو هەڵواسرابوو لەماڵی خۆیدا بەلگەیە لەسەر پەیوەندیکردنی بەوانەوە کەناینا سی‌و میوانداری کەسانی نەناسراو یان ئەوانەی چاوی پێیان گەشدەبێ، ئەگەر گۆشتی هەڵواسراوو لەڕولاوازبوو بەلگەیە لەسەرنەوەی ئەو هاوڕێیانەی بەدەستهێناون هەژارن.
*ئەگەر گۆشتەکەی لەماڵی خۆیدا بەتوێتوێکراوی‌و هەڵواسراوی بینی

بەلاَو نەهامەتییە دێتە رێی ئەگەر قەڵەوبوو لەمردوو ماڵوسامانی دەستدەکەوێ، ئەگەر لاوازبوو بۆی بەجێنامێنێت.

*هەروەها دەڵێن: گۆشتی مەڕ ئەگەر لێنرابوو ماڵوسامانە بەماندوبوون دەستگیردەبێ ئەگەر خراپو بۆگەنبوو غەمو پەژارەو ئاژاوەیە.

*گۆشتی نەکوڵاو غەمو پەژارەو ئاژاوەو دەنگەدەنگە.

*ئەو گۆشتەی مرۆڤ دەیبینێ خراپ بوەو دەیخوات هەمووی خراپەو بەڵگەیە لەسەر تیاچوونی شتێك کەخاوەنیەتی چونکە سروشتی خۆی ناتوانی هەرسیبکات.

*هەندێك لەراڤەکاران دەڵێن: گۆشتی بۆگەن خراپە بۆیەکێك ببینێو نەیخوات، بەلاَم ئەوەی خواردی بۆیباشە، ئەگەر بینی گۆشتێکی لێنراوی خوارد ماڵوسامانی زیاددەکات.

*ئەگەر لەگەڵ پیرێکدا خواردی پلەوپایەی لای دەستەلاَتدار بەرزدەبێتەوە.

*حوشتری سوورەوکراو جیاوازی هەیە دەربارەی.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر قەڵەوبوو ماڵو سامانێکی زۆرە، ئەگەر لاوازیشبوو رزقو رۆزییەکی کەمە بەهیلاکیو ماندوبوون دەستیدەکەوێ.

*هەندێکدەڵێن: گۆشتی حوشتر بەسورەوەکراوی دڵنیاییە لەترسوبیم.

*هەندێکدەڵێن: حوشتری سورەوەکراو کوڕە.

*ئەگەر بینی دەیخوات یا لێیدەخوات کوڕێکی پێدەبەخشرێو گەورە دەبێو لەکاسبی خۆیدەخوات، ئەگەر کولاَوبوو کوڕەکەی رەوشتبەرزی پێدەدرێ، ئەگەر نەکولاَوبوو لەکاروکاسبیدا ژیر نابێ.

*هەروەها وتراوە: هەموو سورەوەکراوێکی بازاڕ مژدەیە، ئەگەر نەکولاَبوو غەمو پەژارەیە لەلایەن کوڕەکەیەوە رووی تێدەکات.

*ئەگەر گۆشتی سورەوەکراو دوا لەگەڵی لەتیاچوون قوتاردەبێ بەپێی چیرۆکی ئەو گۆشتەژاراوییەی گوفتاری لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)کرد[1].

*سەری تەنوریش سەرۆکە، ئەگەربینی سەری ئاژەڵێکی گەورەی کڕیو قەڵەوبوو سوود لەمامۆستاکەی دەکات، ئەگەر لاوازبوو هیچ سوودێکی لێناکات.

---

[1](ئەبوداود) (٤٥١١) و(دارمی : ٦٧).

*ئەگـــەر ســـەرەكەی بۆگـــەنبوو پیاهەڵدانێكی خراپی پێدا هەڵدەدەنو خواردنی سەری ئاژەڵی بۆگەن بەڵگەیە لەســـــەرئەوەی غەیبـــــەتی گەورەكەیدەكات.

*خواردنی سەری لێنراووسوورەوەكراو ســوودوەرگرتنە لەهەنــدێك ســەركردە لەرووی ماڵو پارەوە.

*هەنــدێك لەراڤــەكارانی خــەودەڵێن: ئەگەر بینی كەللەی مەڕو پاچەو مۆخی دەخــوات مــاڵو ســامانو میراتــی كەسانیتری بۆ دەمێنێتەوە.

*هــەروەها دەڵــێن: ســەری مــەڕ لەلێكدانــەوەدا ماڵــەو پــتر لەدەهــەزار درهەمەو كەمەكەی هەزار درهەمە.

*خـــواردنی ســـەری ســـوورەوكراو خواردنی ماڵی گەورە پیاوانە.

*خواردنی مۆخ خـواردنی ماڵوسامانە یـــان خـــواردنی مـــاڵی شـــاراوەیە، ئەگـــەربینی لـــەمۆخی خـــۆیو هـــیتر دەخـــوات لــــەماڵی خۆیـــدەخوات كەهەڵیگرتووە.

*ئەگــەر مــۆخی پاچــەكەی خــوارد لەكرۆكی ماڵی خۆیدەخوات.

*خــواردنی ســەروپێ جیــاوازی هەیــە لەبارەیــەوە، هەندێكــدەڵێن: خــواردنی مــاڵی هــەتیوە، هەنــدێكیتر دەڵــێن: خــواردنی مــاڵی گەورەپیاوانــە چــونكە ســـەرووپێ ماڵوســـامانە، مـــەڕیش بەڵگەیـــە لەســـەر خـــەڵكی گـــەورەی شكۆمەند.

*خواردنی پێستەی حوشتر خـواردنی مـــاڵی هـــەتیوە، خـــواردنی جگـــەر بەدەســتهێنانی هێــزو توانایــە لەلایــەن كوڕەوە.

*خواردنی ریخۆڵە لەشساغیو خێرە.

*ریخۆڵــەی پــڕ لەگۆشــت ماڵوســامانی هــەڵگیراوە یــان ماڵوســامانە لەلایــەن ژنەوە.

*گۆشــتی باڵنــدە ئەگــەر لێنــراو یــا سورەوەكراوبوو رزقو رۆزیو فرۆفێـڵو ناپاكییـــە لەلایـــەن ژنـــەوە، ئەگـــەر نەكولابوو غەیبەتی ژنێكدەكات پاشـان ستەمی لێدەكات.

*ئەگــەر بینــی گۆشــتی باڵندەیــەكی خوارد گۆشتی نەدەخورا لەكاڵی گـەلو كۆمەڵێكی ستەمكار بەفرۆفێڵدەخوات.

*هــەروەها وتــراوە: خــواردنی گۆشــتی مریشكو قــاز خێــرو باشــە بــۆ هــەموو خەڵكی چونكە گۆشتی مریشك بەڵگەیە لەســـەر ســـوودو قـــازانج لەلایـــەن ئـــەو ژنانــەی تایبــەتن پێــوەی، لەبەرئــەوەی مریـــشك لـــەژن دەچـــێ لەرۆیـــشتنداو

قـازیش بەڵگەیـە لەسـەر سـوودێکی گەورە لەلایەن ئەوانەی ڕەهن دەکەن.

* زەڕنەقووتەو بەچکەی باڵندە ئەگەر سـوورەوەکراوبوو مـاڵو داراییـە بەماندوبوون دەستگیردەبێت.

* ئەگـەر بینـی بەچـکەیەکی تۆپیـو دەخـوات غەیبـەتی خانـەوادەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکـات یـان غەیبـەتی خەڵکی ڕێزداردەکات، ئەگەر بەچکەی باڵـندەبوو باڵـندەبوو غەیبـەتی کـوڕو منداڵی بـەرپرسو فـەرمانڕەوا دەکـات یـاخود گوناهێـك ئەنجامـدەدات لەگەڵیان.

* ئەوباڵندانەشـی گۆشـتیان دەخـورێ بەدەستهێنانی ماڵوسامانە لەزەوییـەك بەئەندازەی هـەزار درهـەم یان شـەش هـەزار درهـەم چونکە شـەش ئەندامی هەیە شەش ئەندامو سەرێكو دووباڵو دووقاچو کلکێك.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگـەربینی گۆشـتی مرۆڤێك دەخوات غەیبەتیدەکات.

* ئەگـەر گۆشـتی خۆیخـوارد لەکاروکاسبی خۆیدەخوات.

* ئەگەر ژنێك گۆشتی ژنێکیتری خـوارد کـاری سێکسی لەگـەڵ ئەنجامـدەدات، ئەگـەر ژنێـك گۆشـتی خۆیخـوارد زینادەکات.

* گۆشتی مار ماڵوسامانە لەدوژمنەوە، ئەگـەر بۆگـەنو نـەکوڵابوو غەیبـەتی دوژمنە بۆیەکێك بیخوات.

* خـواردنی گۆشـتی دڕنـدە مـاڵی دەستەڵاتدارە، هەروەها گۆشتی هەموو جـۆرە باڵندەیـەکی دڕنـدەش بەوچەشنەیەو خواردنی گۆشتی بـەراز ماڵێکی حەرامە.

* ئەگـەر بینـی گۆشـتێکی بۆگـەن دەخـوات خێرەبـۆی، ئەگـەر بینـیو نەیخوارد خراپە.

* ئەگەر بینی گۆشتێکی لێنراوی خوارد مـاڵو سـامانی زیـاد دەکـات، ئەگـەر لەگـەڵ پیـاوێکی پـیردا خـواردی پلەوپایـەی لای فـەرمانڕەوایان بەرزدەبێتەوە.

* گۆشـتی مانگـای سـوورەوەکراو دڵنیاییە لـەترس‌وبیم، ئەگەر چاوەڕێی کوڕبـوو کوڕیـدەبێت، وتراویـشە: رزق‌وڕۆزی‌و فەڕو پیتە.

* ئـەو گۆشـتەی کـۆکن لەسـەر حەرامبوونی ماڵێکی حەرامەو ئەوەشی تێدایـە جیاوازییـە لـەنێوان زانایـان سـەبارەت بەماڵوسـامان یـاخود مارەبڕینێـك گومانیـان هـەبێت لەبارەیەوە.

* گۆشـتی باڵـندە سـوود وەرگرتنـە لەسەفەر، دەگونجێت خواردنی گۆشتی

باڵنده بەڵگەبێت لەسەر بەهەشتو ئەوەی لێی نزیکدەکاتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ ، وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾ (الواقعة:٢١).
*گۆشتی درندەکان رزقێکی حەڵاڵە دەگونجێت هۆکاری ماندوبوونو خەتەرناك بێت.
*گۆشتی ماسی رزقێکی ئاسانی حەڵاڵی خێرایە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سوودو قازانجو لەلای دەریاوە یان دەستەڵاتدارەوە.
**گۆشتی مرۆڤ زەفەربردنە بەدوژمن.
*بینینی گۆشتی نادیارو خوێن بەڵگەیە لەسەر زاڵبوونو فیتنە.
*گۆشتی باڵندە ئەگەر لێنرابوو یان سوورەوەکراوبوو رزقو رۆزیو ماڵو فرۆفێڵی ناپاکییە لەلایەن ژنەوە، ئەگەر نەکولابوو باسی ژنێك دەکاتو ستەمی لێدەکات.
*ئەگەر بینی گۆشتی باڵندە دەخوات ئەو باڵندەیەی خواردنی دروست نییە ئەوا لەماڵی کۆمەڵێك ستەمکاری پلانگێڕ دەخوات.
*گۆشتی قاز بەڵگەیە لەسەر سوود لەقەرزدان.
*گۆشتی مرۆڤ بریتیە لەکاروکاسبیو لەشساغیو نەخۆشی یان ماڵ یاخود دوکان یا ئاینو خواناسیو تێڕوانینی بۆ حەلاڵو حەرام یان هێمنیو تووڕەییو غەمو پەژارەو عەورەتو بەلاونەهامەتیو سزا.
*ئەگەر بینی گۆشتی زیادیکردوە بژێوی زیاددەکات، ئەگەر نەخۆشبوو پارێزراو دەبێت.
*ئەگەر بینی گۆشتەکەی کەموکوڕی هەیە بەڵگەیە لەسەر وەستانی حاڵوباری یاخود نەخۆشی.
*ئەگەر خواناسێك بینی گۆشتی زیادیکروە ساردەبێتەوە لەبەندایەتیو سەرقاڵدەبێت بەدنیاو خۆشیەکانیەوە، ئەگەر کەمبوو بەپێچەوانەوەیە.
*ئەگەر گۆشتی مرۆڤی کڕی کاڵاو شتومەکی بێبازارە.
*ئەگەر فەرمانڕەوایەك بینی گۆشتی زیادی کردوە حوکمو دەستەڵاتی زیاد دەکاتو ماڵوسامانی زۆردەبێت، دەگونجێت فرە تووڕەبێ.
*دەگونجێت زۆربوونی گۆشتی مرۆڤ بەڵگەبێت لەسەر خۆشیو شادیو کەمیشی غەموپەژارە بێت.
*ئەگەر بینی گۆشتەکەی رەشهەڵگەڕا یان شینبوو یاخود پارچەپارچەبوو لێیکەوتەخوارەوە بەڵگەیە لەسەر ناڕەحەتیەك رووی تێدەکات وەك سزا یان نەخۆشی.

*ئەگەر لەگۆشتی زیادەی خۆیخوارد سوودەخوات و سەرمایەکەی دەمێنێتەوە، ئەگەر گۆشتی زیادەیخوارد رۆدەچێ لەسەرمایەکەیدا یان پەشیماندەبێتەوە لەکردارێك ئەنجامیدەدات.

**گۆشتخۆر:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ژنە یاخود تێکـڕژان و کوشتارو نەخۆشییە.

**گۆشتفرۆش:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر دڵنیابوون لەترس وبیم و پارێزگاری و بێدەنگی و زاڵبوون بەسەر دوژمنانیداو هەروەها پیاوێکە خەڵکی هاندەدات بۆ سەفەر.

*بینینی لەنزیك تەنوور نانەوادا بەڵگەیە لەسەر ئەو شۆفێرەی منالان لەماڵەوە دەگوێزرێتەوە بۆ قوتابخانەکان.

**گۆشەنشینی:** (نابلسی) دەڵێت:گۆشەنشینی مرۆڤ لەخەودا مانەوەیە لەشوێنێکدا.

*ئەوەی لەدوکانێکدا خۆی دەبینێتەوە بۆ بژێوی پەیداکردن گۆشەنشین دەبێت.

**گۆنا(کوڵم):** هەردوو کوڵم و گۆنا بەڵگەن لەسەر ئەوەی مرۆڤ خۆی پێدەڕازێنێتەوەو ئارەزوویدەکات.

*دەگونجێت هەردوو کوڵم بەڵگەبن لەسەر ئەوەی ماچیاندەکات، ئەو بەڵاو نەهامەتیەی رووی تێدەکات.

*دەگونجێت کوڵم و گۆنا بەڵگەبن لەسەر ملکەچی ئەگەر خاك و خۆڵبن ئەمەش بۆ ئایینداران زیادەو بەرزییەو لای پەروەردگار چونکە ئەمە لەرەوشی تێکۆشەرو زانایانە.

**گوێژ:** ئەگەر زەردبوو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی بەئەندازەی تۆخی و پێگەیشتنی، ئەوەی سەوزە نەخۆشی نییە.

*بەهەمان چەشن و شێوە هەموو بەروبوومێکی زەرد نەخۆشییە جگە لەنارنج و سێوو نەبك ئەوانە زەردیان بێزیانە بەهۆی گرنگی و بەسوودی ناوەڕۆکیانەوە.



**گەچفرۆش:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گەچفرۆش پیاوێکی دووڕوە بیر پەرت و بڵاوە راهاتوە لەسەر دووڕوویی چونکە یەکەم کەس گەچی داهێنا (فیرعەون)بوو.

(نابلسی)دەڵێت: ئەوەی گەچ دروستدەکات لەگەڵ گەچکاردا، گەچکاری سەربانو شوێنی ئاو بینینی بەڵگەیە لەسەر کارئاسانیو ڕەواندنەوەی غەمو پەژارەو وشەڕو خراپەو بۆڵە بۆڵ.

**گەچکار(سپیکار):** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر گوناهو تاوانو غەمو پەژارەو بۆڵەبۆڵو ئاگر کەوتنەوە، هەروەها ئەوەی خشتی سوور سووردەکاتەوە بەوچەشنەیە.

* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر دەرەنجامی نەخۆشو ئاوەدانیو وێرانی.

**گەچکاری(سپیکاری):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+شکۆمەندیو پلەوپایەی بەرز.

+باشی حاڵوباری هاوسەرو ماڵومنداڵ.

+جێگیربوون لەسەر ئاینو زانستو پیشەو فرمان.

+نوێکردنەوەی جلوبەرگو پەیمانی دروست هەروەها قسڵیش بەو چەشنەیە.

* لای خواناسانو دنیا نەویستان بەڵگەیە لەسەر بەرکەوتنی کەردەکانی حەرامو ماڵو پارەپەیداکردن بەگومانو دوودڵیو بەگەڕخستنی بیدعەتو فەرامۆشکردنی سوننەتو دووڕوویی لەئاینی خوادا.

**گەدە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا تەمەنو رزقو رۆزیو بژێوییە.

* ئەگەربینی گەدەی بەهێزو دروستە ئەوی خێرو تەمەندرێژییە، وەگەرنا واژووی ئەوەیە.

* خاڵیکردنەوەی گەدەو پاکێتی لەپیسی بەڵگەیە لەسەر خێرو پشوو چارەسەر لەنەخۆشی.

**گەردن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گەردن دانانی ئەسپەردەو ئەمانەتەو درێژبوونی قوڵبوونەوەیە لەئایندا لەگەڵ ئەمانەتپارێزیو کەمو کوڕی لەئەمانەتدا.

* ئەگەر مارێکی لەگەردنو ئەستۆی خۆیدا بینی پێچی خواردبوو ماڵو سامانی خۆی پاکدەکاتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿سيطوقون ما بخلوا به يوم القيامة﴾ (آل عمران: ١٩).

* ئەگەر بینی دوورەگی ملی خوێنینان لێهات دەمرێ.

* ئەگەر پێشەوایەك رەقیو زبری لەملی خۆیدا بینی هێزو تواناو دادپەروەریو سەرکەوتنە بەسەر دوژمنەکانیدا.

*ئەگەر گەردنی ئەستوربوو لەدواوە هێزەو خوداوەند پێی بەخشیوە، باشی گەردن بەڵگەیە لەسەر هەڵهاتن.
*مووی گەردن بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قەرزارەو قەرزی لای خەڵك هەیە.
*تاشینی مووی گەردن گەیاندنی ئەمانەتو قەرزدانەوەیە، ئەگەر بینی هیچ موویەکی پێوە نییە بەڵگەیە لەسەر ئیفلاسو مایەپووچی.
*پیاوێك بینی گەردنی نەدرێژەو نەکورتو خەونەکەی بۆ راڤەکارێك گێڕایەو وتی: ئەگەر بەدخوویێت رەوشتو خووت باشدەبێ ئەگەر ئازابیت بەشت زیاددەکات، ئەگەر خووت خراپبێت رێزدارتر دەبی.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا جێگەی ئەمانەتە، ئەگەر بینی گەردنی ئەستوربوە ئەمانەتی هەڵگرتوەو دەیگەیەنێت، ئەگەر ناسکبوو ستەمکارەو ناتوانێ ئەمانەت هەڵبگرێ.
*ئەگەر گەردنی ئێشو ئازاری هەبوو لەمامەڵە یان ئەمانەتگەریدا خراپ دەبێ، ئەوەی دەبینرێ لەگەردنو شتومەك یان گرێ قەرزەو کۆدەبێتەوە لەسەری.
*ئەگەر بینی لەگەردنی درا بەشمشێر چاکدەبێتەوە ئەگەر نەخۆشبێ.

*ئەگەر بینی لەگەردنی درا بەشمشێر چاکدەبێتەوە ئەگەر نەخۆشبوو.
*ئەگەر لەگەردنی منداڵێکی لووسکەیدا دەمرێ چونکە منداڵ گومان دروستدەکات.
*ئەگەر لەگەردنی خۆیدرا خوداوەند غەمو پەژارەی دەرەوێتەوە، ئەگەر قەرزاربوو دەیداتەوەو قوتاردەبێت لێی، زیندانیش بەهەمان شێوەیە لەزیندانو قوتاردەبێ.
*گەردن شوێنی گەواهیدانو وەسیەتو زەکاتو قەرزە کەوابەستەی دەبێت.
*ئەگەر بینی گەردنی باشو جوانو قەڵەوە گونجاویشە لەگەڵ لەشو لاریدا بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەیەکی باش گەردنی پێی بەرزو بڵنددەکاتەوە.
*ئەگەر گەواهیدەر گەردنی خۆی بینی گەواهیو شەهادەدەداتو خۆی رزگاردەکات لەوەی خراوەتە ئەستۆی، ئەگەر ئەمانەتێکی لابوو قوتاردەبێ لێی یان زەکاتی ماڵو دارایی دەدات یاخود قەرزی ئەستۆی دەداتەوە.
*ئەگەر دومەڵ یا کێمو زوخمی لەگەردندا بینی یان خوێنی لەبەر رۆیی بەڵگەیە لەسەر سەرقاڵیو وابەستەبوونی.

*ئەگەر نووسراوێكی لەگەردنیدا بینی بەڵگەیە لەسەر نزیكی سووتانی بەئاگر.
*باشی گەردنی ئەوەی لەسەفەردایە بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی لەسەفەرەكەی بەسەلامەتی.
*گەردنی ژنان بەڵگەیە لەسەر ئەو ملوانكەو زیڕانەی دەیكەنە گەردنو ملیان ، هەروەها ملوگەردنی منداڵیش بەهەمان شێوازە.
*ئەگەر پەتێك یان وایەرێكی لەگەردنی خۆیدا بینی دووڕومەرجان یا گەووهەری تێدابوو بەڵگەیە لەسەر چاكەو فەزڵی زانیاریو جێبەجێكردنی حەقو راستی.
*ئەگەر بینی پێغەمبەر (ﷺ)گەردنی كونكرد سەرزەنشتی دەكات لەسەر رەفتاری خراپو بەدی.
*دەگونجێت گەردن بەڵگەبێت لەسەر:
+قەرزدانەوە.
+چاكبوونەوە لەنەخۆشی.
*ئەگەر باڵندەیەكی بەگەردنی خۆیەوە بینی ئەگەر سپیبوە كردارێكی چاكو باشەو ئەگەر رەشبوو كردارێكی بەدو خراپە.
*ئەگەر بینی قورئانێك لەگەردنیدایە بەجێهێنانی پەیمانو بەڵێنو حەقە لەگەڵ خوێندنەوەی قورئان وەرگرتنی زانیاریی.

(نابلسی) دەڵێت: دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ملو دەستەڵات، ئەگەر زیندانیەكی لەئەستۆو گەردنی منداڵێكا بینی موڵكو دەستەڵاتی بەردەوامدەبێت.

**گەردنبەند:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بۆ پیاوان خنكاندنەو بۆ ژن جوانیو كوڕە لەهاوسەرێك ، ئەگەر زێڕبوو لەهاوسەرێكی عەجەمیەوەیە، ئەگەر لەمرواریو زەبەرجەدبوو شوودەكات بەپیاوێكی بەرزو بڵندو دووكچی لەو ژنە دەبێتو دەكات بەهیوای خۆی.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: بۆپیاو چاكەی ژنە لەگەڵ مێردەكەیداو دەوڵەمەندیو فراوانییە بۆ مێردەكەیداو دەوڵەمەندیو فراوانییە بۆ مێرد ، ئەگەر لەئاسنبوو هێزیەتی بەلام ئەگەر لەداربوو لەناوەڕستەكەیدا لەكونێكی تیابوو بۆ دەستەڵاتدار سەركەوتنەو بۆ بازرگان سوودو قازانجە.
*ئەگەر بینی تەوقێكی تەسككراوەتە گەردنی رژدو رەزیلە، ئەگەر خاوەنی ئەو خەونە خواناسبوو هیچ كەسێك لەئاینپەروەران سوودی لێوەرناگرن، ئەگەر زانابوو ئەوە زانیارییەكەی دەشارێتەوە، خوداوەند دەفەرموێ:

﴿يطوقون ما بخلوا به يوم القيامة﴾ (آل عمران :١٨٠).

*ئەگەر كچێك بینی لەگەردنیدا تەوقێكی زیوی تێدایە بازرگانیدەكات بەپێی پێویستو سوودی لێوەردەگرێ، یاخود لەبازرگانیەكەی سوود وەردەگرێ لەماڵو دارایی یان كچێك لەبەدەستدەهێنێت چونكە بنەڕەتی زیو ژنە.

*هەروەها دەڵێن: گەردنبەند لەهەر جۆرێك بێت تێكچوونی ئاینە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر تەوقێكی لەگەردنیدا بینی رژدو بەخیلە، هەروەها دەڵێن: هەموو جۆرەكانی گەردنبەند تێكچوونی ئاینە، لەگەردنكردنی تەوق بەڵگەیە لەسەر رژدیی.

*دەگونجێت لەگەردنبەندكردنی بەڵگەبێت لەسەر موڵكو دەستەڵات یان كوڕو ئەمانەت.

**گەردنی بەندە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: گەردنی بەندەی مەرگی ئازادكاریەتی، ئەگەر ئازادبوو خۆی بەختدەكات یا كەسانیتر خۆیان بەختدەكەن، ئەگەر خەوبینەر نەخۆشبوو لەشساغیو تەندروستی باشدەبێت، ئەگەر قەرزاربوو قەرزەكانی دەداتەوە.

**گەرم:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا شتێكی گەرمی لەخواردنو خواردنەوە بینی دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رزقو رۆزییەكی ئەستەمو فرە ماندوكار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر كاروكاسبی حەرام نەمانی فەڕو بەرەكەت.

*ئەگەربینی مردوویەك بەناوی گەرم دەشۆرێ یان دەیخواتەوە دەخرێتە ئاگری دۆزەخەوە.

**گەرما:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا گەرمابوو خەونەكەی لەزستاندابێت بەڵگەیە لەسەر سوودو رزقو هێمنی دەروون، خۆئەگەر لەهاویندابێت پێچەوانەی ئەوەیە.

**گەروو( بین ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی دەكۆكێت سكاڵای حاڵدەكات لەمرۆڤێك پەیوەندی هەیە بەفەرمانڕەواوە.

*ئەگەر بینی وەك ئەوەی دەكۆكێت هەتا رۆژهەڵهات دەمرێت.

*دەڵێن: كۆكە بەڵگەیە لەسەرئەوەی دەیەوێت سكاڵاو شكات لەمرۆڤێك بكات بەڵام نایكات.

*ئەگەر بینی لەنێوگەرووی موو دەردێت یان بەكرەیەكو

درێژدەبێتەوەو نەبچڕێت یان بەتەواوی دەرینەهێنێت ڕکەبەرایەتیو ناکۆکی لەگەڵ فەرمانڕەواو گەورەکەیدا درێژە دەخایەنێت.

*ئەگەر بازرگانبوو کاڵاو شتومەکەکەی دەفرۆشێت.

(نابلسی)دەڵێت: گەرووی مرۆڤ بەڵگەیە لەسەر تیاچوونی ماڵوڵانەو مێر یاخود چەن ماڵێك ئەگەر ناتەواویو کەم کورپییەکی لەگەروویدا بینی لەماڵەکەیدایە کەدەفەوتیو تیادەچێت.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر نوێنەرو مردنو ژیان.

**گەڕانەوە:** (نابلسی) دەڵێن: لەخەودا واژووی هەڵهاتنە، ئەگەر مرۆڤ لەخەودا گەڕایەوە سەر دوژمنەکەی دوای هەڵهاتنی سەرکەوتوودەبێت بەسەرو وەسوەسەو بۆ چوونیدا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پەشیمانیو تەوبەو گەڕانەوە بۆ خێروچاکە.

**گەڕانەوە لەسەفەر:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی حەقو ئەرکێکی سەرشان، هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر دەرووی خێرو قوتاربوون لەباروحاڵێکی خراپو بەدەستهێنانی نازو نیعمەت.

*دەگونجێت ئەو خەونە بەڵگەبێت لەسەر تەوبەی خەوبینەر لەگوناهو تاوان چونکە لەماناکانی تەوبە پاشگەزبوونەوەیە لەتاوانو گوناه.

**گەڕانەوەی ژنی تەڵاقدراو:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەرەنجامو چارەنووسی نەخۆش یاخود گەڕانەوەی بۆ ئاینداری یان بۆ مەزهەبو پیشەو لای کورەکەی.

**گەڕۆك(گەڕییدە):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی بەدەوری (کابە)دا دەسووڕێتەوە ئەگەر سەرپێچیکاربێت لەئاگر قوتار دەبێ، ئەگەر رەبەن بێت هاوسەردەگریو ئەگەر شایستەی پلەوپایەبێت بەدەستیدەهێنێت، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەمەکداری لەبەجێهێنانی نەزردا بەپێی ئایەتی: ﴿ وَلۡيُوفُواْ نُذُورَهُمۡ وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ ﴾ (الحج: ٢٩).

*ئەگەر بینی حەجیکردو بەدەوری (بیت)دا سووڕایەوەو چاکی ئاینو جێگیربوونیەتی لەسەر بەرنامەو بەدەستهێنانی پاداشتە لەلایەن خوداوەندەوو دڵنیادەبێ لەوەی لێی دەترسنو قەرز دەداتەوەو ئەسپەردەو ئەمانەت دەگەیەنێ چونکە ئەمینو دەستپاکو هەژارەو خاوەنی چاکەیە .

*دەگونجێت تەوافەکەی بەڵگەبێت لەسەر سەرکردن بەکاری پێشەوایەکی بەڕێزدا.

**گەڕەك:** (نابلسی) دەڵێت: چوونەنێو گەڕەکێك لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کەوتنەنێو گومانەوە بەهۆی ئەو پێچاوپێچییەی هەیە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سوێند بەدرۆخواردن و جیاوازی کەفارەتەکەیبێت.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر رێگەی پیشەسازی.

**گەڕیی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی گەڕبوە کردەوەکانی بەتاڵدەبێتەوە بەپشت سووری بەرانبەر خوداو تاوانێکی خراپ و ناقۆڵا دەخرێتە پاڵی لەکاتێکدا پاك و بێتاوانە.

*ئەگەربینی گەڕییەکە زیادەیەکی لەجەستەدا دروستمکردووە یان لوویەك ماڵ‌ودارابیەکە دەمێنێتەوە.

*ئەگەربینی لەنوێژدایەو گەڕبوە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر لەبیرچوونی قورئانی پیرۆز.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا خۆم بەگەڕی بینی ئەویش وتی: تۆپیاوێکی تاوانێکی خراپ دەدرێتە پاڵت و تۆش بێتاوانی، وشك هەڵهاتنی پێستیش ماڵ‌و داراییەکە خاوەنەکەی دەترسێ داوای بکات.

(نابلسی) دەڵێت: گەڕی بەڵگەیەلەسەر ماڵ‌ودارایی حەرام، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئاگر کەوتنەوە.

*هەروەها گەڕیی دەوڵەمەندییە.

(ئیبن سیرین)دەڵێت: گەڕی ئەگەر ئاودارنەبێت غەم‌وپەژارەیە لەلایەن خزم‌و کەس‌وکارەوە، ئەگەر ئاوداربوو بەدەستهێنانی ماڵ‌و داراییە بەماندوبوون.

*هەروەها دەڵێن: گەڕیی بۆ هەژاران بەڵگەیە لەسەر ماڵ‌و دارایی‌و بۆ دەڵەمەندیش بەڵگەیە لەسەر پلەوپایە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر گەڕیی‌و پەڵەی بەخۆیەوە بینی باشترە لەوەی لەیەکێکیتر ببینێ، ئەگەر بەیەکێکیترەوە ببینێ هەڵدێت لێی ئەمەش لەکاتی راڤەو لێکدانەوەی خەودا باش نییە.

*ئەگەر زیپکەشی دەرکردبوو تەقی‌و کێم‌و زوخمەکەی بلاوبوەوە بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتن‌و زەفەر بردن، گەڕی‌و ئاوڵەو نەخۆشیەکانی تری پێست بەڵگەیە لەسەر ماڵێکی زۆر.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر گەڕی لەلەش و لاریدابوو زیان روودەکاتە براکانی و بژێوی، ئەگەر دابووی لەدەستی راستی روو لەهۆزو تیرەکەی دەکات، ئەگەر دەستی چەپی گرتەوە غەم و پەژارە لەلایەن هاوەڵ یان شەریك یاخود براکەیەوە، ئەگەر بەکوڵمەکانیدا دیاریدا روو لەهۆزەکەی دەکات، ئەگەر بەسەر سکیدا دیاریدا روو لەماڵ و منداڵیدەکات، ئەگەر خورانەدی و بەدەستی بریندارکرد ماڵ و داراییەکە بەغەم و پەژارە دەستیدەکەوێت، ئەگەر کیم و زوخمی تێدابوو بەئەندازەی ئەو کێمە ماڵ و داراییەکی جوولاو تازە سەر هەڵدراو بەدەستدەهێنێت، ئەگەر زەرەری تێدابوو بەسەر ماڵێکدا دەکەوێت ماندووبوونی تێدایە.

*هەروەها دەڵێن: گەڕی و خوراندن غەم و پەژارەو دەستەلاتە یا گەل و نەتەوەیەکی بەزیان و زیانی پێدەگەیەنن.

*ئەگەر گەڕی بەکەسانیترەوە بینی بەڵگەیە لەسەر غەم و پەژارەو کەم وکوڕی و شکۆمەندی بۆئەوەی خەوەکەی بینیوە بەتایبەت ئەگەر بەخزمەتکارەکەیەوە بینی بەکەڵکی خزمەتکاری نایەت، ئەگەر کوڕەکەیبوو گوێڕایەڵی باوکی ناکات لەتێکەڵبووندا، ئەگەر ژنەکەیبوو بەڵگەیە لەسەر هەر رەفتارێك ئەنجامدەدات ناقۆڵاییە هەروەها ئەوەشی لەگەڵیدا تێکەڵدەبێت.

*ئەگەر گەڕی بینی لەئەستۆو گەرنیدا قەرزو وامێکە کۆدەبێتەوە لەسەری.

**گەزۆ:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا رزق و رۆزیەکی حەلاڵە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر منەتکردن بەسەر بەرانبەردا.

*گەزۆ رزق و رۆزییە لەلایەن خوداوە ئەگەر بینی گەزۆ دەخوات رزق و رۆزی بەبێماندوبوون بەدەستدەهێنێ.

*دەگونجێت منەتبێت کەسێك بیکات بەسەر بەرانبەرەکەیدا لەبری ئازادکردنی لەقەرز یاخود یارمەتیداندا.

**گەشت:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سەفەرێکی باشە تێدا فراوانی و گونجاوی دەستگیر دەبێت.

*هەروەها دەڵێن: سەفەرێکە بۆ لای پادشایەکی مەزن و خاوەن شکۆ تێدا خۆشی و ناواختنی خۆراکە، خواردن و ئەو سینییەی لەسەریدەخورێ و لەتەختە دروستدەکرێ بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی ماڵ و دارایی لەسەفەردا.

*سینی گڵێنەش بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی لەشارستان و ئاوەدانیدا.

(نابلسی) دەڵێت: گەشت سەفەرو گرتن‌و فەڕی خودایییە.

**گەشتەوان:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری کاتی (مُتعة)و ئارەزووی بەهانەگیری.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر منداڵی زینا یاخود سەرکردایەتی.

**گەشتیار:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گەشتیار خوازیاری زانیاری‌و کاروباری پادشایانە.

**گەلای دارخورما:** لەخەودا قسەو وتەی شەرو خراپەیە یاخود هەواڵێکی دڵخۆشکەرە.

**گەنجینە:** لەخەودا ژنی پیاوە ، ئەگەر بینی گەنجینەکەی شکاوە ژنەکەی دەمرێت، گەنجینە لەخەودا کیژەو بەڵگەیە لەسەر:

+پاراستنی نهێنی‌و داپۆشینی کاروبارو شاردنەوەی لەهاوسەر.

+جل‌وبەرگی درەوشاوە.

+شەوورۆژ.

(نابلسی) دەڵێت: هەرکەسێك لەخەودا ببینێ خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر رزق‌و رۆزی حەلاڵ‌و دەستکەوت‌و گەنجینە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر میراتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کوڕی زینا یاخود یەکێك دۆزرابێتەوە چونکە لەدەستکەوت‌و کەسبی یەکێکیترە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر دوگیانی ژن چونکە کوڕان ئاڵتوون‌و کچانیش زێڕ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵ‌و سامانێکی بێشومار یان زانیاری بۆ زاناو رزق‌و رۆزی بۆ بازرگان‌و دەستەلاتێك بۆئەوەی شایستەیەتی‌و دادپەوەرە.

*هەروەها دەڵێن: گەنج بەڵگەیە لەسەر شەهیدبوون ، هەروەها کۆمەڵە کردارێك مەردووم لەولاتی جیاواز جیاوازدا دەیکات.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر بینی گەنجێکی دۆزیوەتەوەو ماڵ‌و سامانی تێداتیە بەڵگەیە لەسەر ناڕەحەتی.

*دەگێڕنەوە ژنێك کچێکی مردووی خۆی دەبینێ پێی دەڵێ: کچی شیرینم کام کردار باشبوو ؟ ئەویش دەڵێت: گوێز دابەش بکە بەسەر هەژاراندا، ئنجا خەوەکەی بۆ (ئیبن سیرین) دەگێڕێتەوەو ئەویش دەڵێت: با ئەو ژنە گەنجینەکەی دەربهێنی‌و بیکات بەخێر، ژنەکەش دەڵێ: خوایەگیان داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم، گەنجینەیەکم هەبوو لەرۆژانی

بڵاوبوونەوەی پەتای کۆکەدا شاردبوومەوە.
*پیاوێك بینی شەو لەسەریەك لەخەویا دەبینیّ یەکێك دێتە لای و پێی دەڵیّ: بچۆ بۆ (بەسرە) لەویّ گەنجینەیەکت هەیە هەڵیبگرە، گوێی لەو بانگەشەیە نەگرت هەتا شەوی سێیەم، ئنجا ویستی روویکاتە (بەسرە) شتومەکانی کۆکردەوەو کاتیّ گەیشتە (بەسرە) دەرۆژ پێیدا گەڕا هیچ شتێکی بۆ دەرنەکەوت و نائومێدبوو لۆمەی خۆیکردو رۆژێکیان خۆیکرد بەوێنێکی وێرانەدا ماڵێکی داڕوخاوی تاریکبوو کەوا چیداو دەفتەرێکی تێدا بەدیکردو دەریهێنا تەماشایکرد، هیچی لێحاڵینەبوو بەزوبانی عیبری نوسرابوو، هیچ کەسێکیشی لەشاری (بەسرە) دەستنەکەوت بیخوێنێتەوە، دەفتەرەکەیهێنا بۆ لاوێك لەشاری (بەغداد) کاتیّ تەماشایکرد ویستی بیفرۆشیّ پێی ئەویش وتی: نایفرۆشم بەلام بۆم وەریگێرە دواتر نوسخە بنەڕەتەکەی دەدەم بەتۆ ئەویش بۆی وەرگێڕاو ئەوکتێبەش باسی لەلێکدانەوەی خەو دەکرد.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا زانیارییە ئەگەر بینی گەنجینەیەکی دۆزییەوە زانیاری بەدەستدەهێنیّ ئەگەر قوتابی زانست بێت، ئەگەر بازرگانبوو بازرگانیو بەخشندەیی پێدەدریّ.
*ئەگەر خاوەن دەستەلاتبوو دەستەلاتو زانیاری بەدەستدەهێنیّ لەگەڵ دادپەوەریدا هەموو پیشەوەرێکیش لەپیشەکەیدا هەر بەوچەشنەیە.
*ئەگەر گەنجینەکە ماڵێکی بینی دەوڵەمەند دەبیّو دادگایی دەکریّ.
*ئەگەر بینی ماڵو سامانێکی زۆری بەدەستهێنا لەدنیادا بەشەهیدی دێتە دەرەوە.
*ئەگەر پادشایەك ببینیّ دەستیگرت بەسەر گەنجینەداو دڵخۆشبوو پێی بەڵگەیە لەسەر تیاچوونی دەستەلاتەکەی.
*هەروەها گەنجینە بەڵگەیە لەسەر:
+ئاسانکردنی کاروبار.
+میراتی.
+غەمو پەژارە.
*دەگونجێت گەنجینە جلوبەرگ بێتو کانزاش کە بێت بۆئەوەی خوازیاری هاوسەرگیرییە.
*دەگونجێت گەنجینە بەڵگەبێت لەسەر ماڵو سامانێك مرۆڤ کۆیبکاتەوەو زەکاتی نەدات.

*گەنجینــە دوكــانو فرۆشــگایەكی سوودمەندە.

*دەگونجێــت بەڵگــەبێت لەســەر دۆزینــەوەی شــتی ونبــوو یــاخود بیركردنــەوە دوای لــەبیركردن، ئەگــەر گەنجینەیــەكی دۆزییــەوەو شــتێكی تێدابوو نەیدەتوانی بكات پێی بەڵگەیە لەسەر پیاوێكی رژدو زەكات نــەدەر، ئەگــــەر زانــــابوو رژد دەبێـــــت لەزانیارییەكەیدا، ئەگــەر فــەرمانڕەوابوو دادپــەوەر نابێــت، ئەگــەر خەوبینــەر ژنبــوو بەڵگەیــە لەســەر پاراســتنیو دەســتگرتنی، ئەگــەر هــیچ رێگرێكــی نــەبوو بەڵگەیــە لەســەر بەهــەدەردانیماڵو سامانیو ئابڕووبردنی خۆی بــەڵام ئەم خەونە بۆ كەسانیتر باشدەبێ.

*ئەگــــەر پادشــــایەك گەنجینەیــــەكی دۆزییــەوە و دینــاری تێــدابوو خــەڵكی لێیانــدەبرد ســـەربازەكانی ناپــاكی لێدەكەنو یەكێكیتر بەگەڕیاندەخات.

*گەنجینــە بەڵگەیــە لەســەر كــوڕێكی نەجیبزادەو رەسەنو ماڵودارایی.

**گــەنم:** (ئــیبن ســیرین) دەڵێــت: گــەنم مـــاڵێكی كـــەمی بـــەتامو چـــێژەو كۆبوەتەوە بێماندوبوونو رەنج.

هــەروەها(ئــیبن ســیرین)دەڵێــت: گــەنم ماڵێكی حەڵاڵە بەناڕەحەتیو ماندوبوون دەســــتدەكەوێت ، كرینــی گــەنمیش بەڵگەیــە لەســەر بەدەســتهێنانی مــاڵ لەگەڵ زیادبوونی منداڵدا.

*چــاندنی گــەنم كارێكــە لــەپێناو رایزكردنــی پەروەردگاردایــە ، هەوڵــدان لەچــاندنیدا بەڵگەیــە لەســەر جیهــادو تێكۆشان.

*ئەگـــەر بینـــی وەك ئـــەوەی گـــەنم دەچـێنێ بــەڵام كــاتێ روا بــوو بــەجۆ بەڵگەیــە لەســــەر ئــەوەی رووكەشــی خێرەو ناخیشی گەندەڵە.

*ئەگەر جۆی چاندو لەبری ئەوە خــوێن راو ماڵی سوودەخوات.

*گوڵــە گــەنمی ســەوز فــەڕو پیتــداری ساڵە ، هی وشــكیش بێفــەڕیو گرانییــە بـــەپێی لێكدانەوەكـــەی (یوســـــف) (سەلامی خوای لێبێت).

*گەنم لەسەر جێ دووگیانی ئافرەتە.

*هــــەروەها دەڵـــێن: ئەگـــەر بینـــی كشتوكاڵدەكات ژنەكەی دووگیاندەبێت.

*ئەگــەر بینــی لــەزەوی كەســێكیتردا كشتوكاڵدەكاتو خاوەنەكەی دەناسێت ژن لەوكەسە دەهێنێت.

*ئەگەر تۆو بچێنێ لەكاتی خۆیدا كــارو كــردەی چــاكە ئەنجامــدەدات، ئەگــەر فـــــــەرمانڕەوابوو دەســـــــــتەڵاتو فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت، ئەگــەر

بازرگـانبوو سـوودو قازانجـەو ئەگـەر کەسـێکی بـازاڕیبوو پلەوپایـەی پێدەبەخشرێ، ئەگەر دنیانەویستبوو خواناسی دەستدەکەوێت.

*ئەگەر بینی گەنمی وشك دەخوات یاخود بەلێنراوی دەیخوات خراپەو زیانێك رووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی سكو پێستو دەمی پڕبوە لەگەنمی وشك یان لێنراو بەسەرچوونی تەمەنیەتی، وەگەرنا بەئەندازەی ئەوەی ماوە دەبێت.

*ئەگەر بەنێو کشتوکاڵێکی دوراودا رۆیی بەنێو ریزی تێکۆشەرو خەباتگێردا دەڕوات.

*هەروەها دەڵێن: کشتوکاڵ لەکرداری مرۆڤ دەچێت لەبەرزیو بالآییو نزمیدا.

*ئەگەر بینی گەنمێکی سەوزی تەڕ دەخوات باشەو لەپارێزکاران دەبێت.

*ئەگەر بینی کشتوکاڵێکی ناسراوی هەیە کردارو رەفتاریەتی لەئاینو دنیادا.

*هەروەها هەریەك لەو حاڵانە بەگوتەو قسەی خەوبینەر لێکدەدرێتەوە، ئەگەر سەبارەت بە ئاینەکەیبوو ئەجرو پاداشتی کردارەکانی لەئاینەکەیدا بەئەندازەی ئەو کشتوکاڵە سوودو قازانجە، ئەگەر لەدنیادابوو ماڵو دارایيەکی جەمو کۆکراوەی پێدەگات، لەبری کردارەکانی پاداشتدەدرێتەوە.

*ئەگەر کردارەکانی خەوبینەر لەکاروباری دنیادابوو جلوبەرگەکەی بەئەندازەی کشتوکاڵەکە ئەو ماڵە بەردەوام بەجەمی دەمێنێتەوە هەتا ئەو دەنکە لەگوڵەکەی دێتە دەرەوە، ئەگەر هاتە دەرەوە ئەو ماڵو دارایيە لەحاڵی یەکەم جیادەبێتەوە، بەلآم ئەگەر جۆ بوو باشترو خۆشترە لەگەڵ تەندروستی ساغو بێخەوشو سووکیو سانایی، ئەگەر ساوەربوو ماڵێکی تەواوەو باشترە لەگەنم، لەبەرئەوەی نان ئاگری بەرکەوتووە.

(ئیبن سیرین)دەڵێت: گەنم ماڵو دارایيەکی پاكو پیرۆزە بەماندوبوون دەستگیر دەبێت، ئەگەر فەرمانڕەوایەکی بینی بەدەستی گەنم دەجوڵێنێ، ماڵو دارایيەکە لەکارو رەنجی کەسیتر بەدەستیدەهێنێت بەئەندازەی کەمیو زۆری.

*ئەگەر لەخەودا بینی دەنکە گەنمی داکەوتوویی هەڵدەگرتەوەو خاوەن کشتوکاڵبوو خەرمانەکەشی دەناسی لەخاوەن کشتوکاڵەکە خێرو چاکەی دەستگیر دەبێت ، هەرچەندە خێرەکە پەرتەوازە بێت بەلآم دەمێنێتەوە.

*ئەگەر مرۆڤێك بینی كشتوكاڵ دەدورێتەوە بەڵام لەكاتی خۆیدا نەبوو مردنە رووەدەكاتە ئەو گەڕەكە لەگەڵ فیتنەو ئاشووبدا، ئەگەر گوڵە گەنمەكان پووچەڵبوون مەرگی بەتەمەن‌و شێخەكانە، ئەگەر سەوزبوو مردنی لاوانە یان كوشتنیانە.

*ئەگەر گەنمی بەدیكرد لەفەرمانڕەوایەكەوە خێرو چاكەی دەستگیر دەبێت، ئەو خواردنەشی لەگەنم دروستدەكرێ ماڵ‌و دارایی حەرامە.

*ئەگەر گەنمی بەجۆ فرۆشت شیعر دەگۆڕێتەوە بەقورئان، گەنمیش لەسەرجێگەدا دووگیانی ژنە.

*هەروەها وتراوە: ئەگەر بینی كشتوكاڵێكی كردوە ژنەكەی دووگیاندەبێت.

*ئەگەر بینی گەنمێكی سەوزی تەڕ دەخوات پیاوچاكێكی خواناسە لەئایندا.

**گەنمفرۆش:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پادشای‌و فەرمانڕەوایەكە پادشاو فەرمانڕەوانی دی رام‌و گوێڕایەڵیدەبن، یاخود بازرگانێكە سەرۆكایەتی بازرگانەكانی دی دەكەن یا پیشەوەرو وەبەرهەمهێنەرو هاوتاكانی گوێبیستیدەبن.

*ئەگەر بینی گەنم لەگەنمفرۆشی دەكڕی دەستەلاَت‌و فەرمانڕەوای لەدەستەلاَتدارێك داوا دەكات.

*ئەگەر بینی فرۆشتی بەبێئەوەی نرخەكەی بزانێ لەكاروبارەكانی دنیانەویستی هەڵدەبژێرێ‌و سوپاسی خودا دەكات لەسەر بەخشش‌و نیعمەتەكانی، چونكە بەهاو نرخی هەمووشتێك سوپاسگوزارییەتی.

*ئەگەر بینی بوە بەخاوەنی گەنم بەلاَم دەستی لێنادات‌و هیچ پێویستییەكی نییە پێی رێزو شكۆمەندی بەدەستدەهێنێت چونكە گەنم بەڕێزترین خواردنە.

*ئەگەر بینی هەوڵدەدات لەبەدەستهێنانیداو پێویستیبوو یاخود دەستی لێدا زەرەرو لابردن لەپۆستی خۆی رووی تێدەكات‌و جیاوازیی دووبەرەكی دەكەوێتە نێوان خۆی‌و خزمەكانی‌و بەپێی چیرۆكی (ئادەم) (سەلامی خوای لێبێت).

(نابلسی) دەڵێت: گەنمفرۆش لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پیاوێكی رێزداری خاوەن ماڵ‌و دارایی، ئەگەر پێویستی بەفرۆشتنی نەبێت، ئەگەر پێویستی بەفرۆشتنی هەبوو ملكەچی‌و سەرشۆڕی رووی تێدەكات.

*ئەگەر فەرمانڕەواو بەرپرس بینرا گەنمدەفرۆشێ بەڵگەیە لەسەر لابردنیو جیاوازی کەوتنە نێوان خۆیو براکەی.
*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر:
+کاری سووکو ئاسان دوای قورسوگران.
+رزقو رۆزی.
+کرداری چاکە.
**گەنمەشامی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵو دارایییەکی زۆرەو دوژمنێکە بەدرەوشتو کەمسوودو قازانجە یاخود بەخاووخلیچکی باسکراوە.
**گەنە( سج ):** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر بەکێشکردنی سەرنج بۆکاری سەیرو سەمەرە.
**گەنەمووی نێوان لێوی خوارو چەناگە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هاوسەر یان کچ.
*هەروەها پەناو پشتگیری پیاوەو خۆی پێهەڵدەکێشێ بەهۆیەوە دەژی.
**گەواهیدان ـ شایەتی( وتنی تەحیات ):** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی دانیشتوە بۆ خوێندنی(تەحیات) غەمو پەژارەی دەرەوێتەوەو پێداویستیەکانی بەجێدێتو بەهیواو ئاواتی خۆیدەگات، ئەگەر لەغەمو پەژارەدا دەژیا دەرووی لێدەکرێتەوە، خوێندنی (تەحیات)یش لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەخێوکەرو بەرپرسێك بەبێ ئەو مارەیی نابەستریێ یان مەرجێکە لەنێو چەند شەریکێکدا دەبێت بەدیبێت.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گەڕانەوەی ماڵو دارایی بەباشترو چاکتر.

## گ ی

**گیاعەنبەر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: عەنبەر ماڵو دارایییە لەلایەن پیاوێکی رێزدارو شکۆمەندەوە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بەکارهێنرا پیاهەڵدانێکی باشە.
*دەگونجێت عەنبەر بەڵگەبێت لەسەر موڵكو زەوی ئەوەی سوودو قازانجی پێدەگەیەنێ، یاخود ئەو بێستانو کێڵگەیەبێت کەسوودو قازانجی لێوەردەگریێ یان زانیارییەکی بەسوودو کەڵکە لەزانایان بەدەستیدەهێنێت.
*دەگونجێت رەشەبا خێربێت لەلای دەریاوە بێت.
*ئەگەر خستییە سەر ئاگر بیدعە لەئاینەکەیدا دروستدەکات یان ماڵو شکۆی خراپ دەبێو تێکدەچێ یاخود لەشوێنی خۆیدا نابێ یان خزمەتی دەستەلاتدار دەکات بەماڵو سامانی خۆی.

**گیاگەزنـە:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: خۆشی یا نەخۆشی لەخۆگرتوە بەهۆی سوودییەوە، توێشووی پیاوە لەکاردا.

**گیانکێشان:** (نابلسی)دەڵێت: لەخـەودا بەربەرەکانییە لەئایندا یاخود گومانە لەقورئاندا.

* دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر روحکێـشانو ئامـادەکردنی ئەوانـەی لەسـەفەردانو هاوسـەرگیری رەبـەن بێـتو گواسـتنەوەبێ لەماڵێکـەوە بـۆ ماڵێکیترو گۆڕینی پیشەوکار.

* دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر قەرزدانـەوەو مافـدانو تەڵاقـدانی هاوسەر.

* ئەگـەر خـۆی لەسـەرەمەرگدابینییەوە لەروحکێشانو هاوچەشنی ئەوە ستەم لـەخۆیو کەسـانیتردەکات. خوداوەنـد دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ﴾ (الانعام: ٩٣).

**گیانەوەری بـەزیان:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ژنێکی دەویتو داوێنپیس.

**گ ی**

**گیـرەرەوە:** (ئـیبن سـیرین) دەڵێـت: بۆفـەرمانڕەوا شـوێنێکی ئاوەدانـەو بـۆ بازرگانیش بازرگانیەکی بەڕێزو پیرۆزە.

(نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا بەڵگـەیـە لەسەر:

+پێشەوا.

+ناخۆشی ژیان.

+رزقو رۆزی.

+شەڕو جەنگ.

**گێزەر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: گێزەر غەمو پەژارەیە بۆ یەکێك بیخوات یان هەیبێت.

* ئەگەر بەدەستیەوە گێزەرێك بگرێت لـەکاروبارێکی سـەختو گراندایـەو سووكو ئاساندەبێت بۆی.

* هەندێکدەڵێن: ئەگەربیبنی وەك ئەوەی گێـزەر دەخـوات خێـرو سـوود بەدەستدەهێنێت.

(نابلـسی)دەڵێـت: گێـزەر لەخـەودا سەرزەنـشتو قـەڵغانو گەڕانەوەیـە، هـەروەها گێـزەر پیـاوێکی دەم پـیسو چەپەڵە.

* گێزەر بەڵگەیە لەسەر پیاوێك هیواو ئاواتی ئاسانو سووکە، ئەوەی گێـزەر بەدەسـتی خۆیـەوە ببینـێ ئەگـەر لـەباروحاڵێکی سـەختوگراندابێت یـا زیندانی بێت قوتاردەبێت.

**گێلی( کـەودەنی ):** (نابلـسی) دەڵێـت: ئـەوەی لەخـەودا وەك کەسـێکی گێـل بەدەربکـەوێت بەڵگەیـە لەسـەر رزقو رۆزی.

# لام



## ل ا

**لابـردن**: (نابلسى) دەڵێت: لابردن لەخەودا تەلاقدانو دەستبەرداربوونی هاوسەرە یان گواستنەوەیە لەپیشەیەکەوە بۆ پیشەیەکیتر.

*خۆدوورخستنەوە لەژن ماڵو دارایی بەفیڕۆدانو بێبەشکردنی منالآنە.

*هەروەها دەڵێن: لابردنو دوورخستنەوە پەیمانە یان دەستەلآتو پۆستە.

*ئەگەر بینی لەپۆستو دەستەلآتێك لابرا خوازیاریبوو دادەنرێت لەو پۆستەدا.

*ئەگەر لەپۆستێك لابرابوو بینی بەرپرسو سەرکردەیەك نوێنەرێکی نارد بۆ لای هەتا لاییبات دایدەنێ.

*ئەگەر بینی لابراو لەجێگەی لاوێك دانرا لەشوێنی دەستەلآتیدا خراپە لەهەندێك دوژمنانیەوە پێدەگات.

**لابردنی خراپە لەسەر ڕێ**: لابردنی خراپە لەسەر ڕێ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر غیرەت لەئایینداو بێداری یان بەڵگەو نیشانەیە لەسەر هاوسەرو منالو خۆپارێزی لەقسەو گوتەدا، یاخود نیشانەو بەڵگەیە لەسەر لێخۆشبوون لەتاوان بەهۆی نەرمو نیانی قسەو گوفتارەوە یان ڕاستگۆیی بەبەردەوامی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پلەوپایە بەرزیو فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە یاخود گرتنەدەستی کاروبارو لەکارخستن.

*ئەگەر لەڕێگەدا دڕكو داڵو بەرد یان هەرشتێکی زیانبەخشی داناو بووبەمایەی زیانی خەڵکی بەڵگەیە لەسەر خراپە لەگوفتارداو زیان گەیاندن بەزمانو دەست ، یان دەگونجێت ببێت بەچەتەی ڕێ، ئەگەر ڕێکخەری ئەو کارە دادوەرو فەرمانڕەوابوو بەڵگەیە لەسەر ستەمو زۆرداریو ڕاسپاردی خەڵکی بەئەرکی قورسو گران.

**لاپـــەڕە (روو):**(نابلــسی) دەڵێــت: مژدەیــە بــۆ کەســێك خــاوەنی بێــت، ئەوەی لاپەڕەیەك ببات یان بگرێ بۆ خۆی مژدەو دەرووڵێکردنەوەیە.

*ئەگەر ژنێکی بینــی لاپەڕەیــەکی دایــە رەچــاوی کارێکــدەکات دەگونجێــت دەرووی لێبکرێتــەوە، ئەگــەر ژنەکــە پەچــــەی کردبــــوو لاپـــــەڕەکان بڵاوبوبوونــــەوە خێرێکــی بەناوبانگــە فەرمانی پێدەکات وریابێت لێی.

*ئەگەر لاپەڕەیەکی پێچراوو لوولکراوی دی بەدەســتییەوە پەشــیماندەبێتەوە لەکرداری خۆی.

*ئەگــەر بەدەســتی چــەپی بنوســێت لەلاپەڕەیەکدا هۆنراوە دەهۆنێتەوە یان کــرداری نــاقۆلا ئەنجامــدەدات یــاخود کــوڕێکی بــەزینادەبێت ئەگــەر بوێــژو شاعیرنەبوو.

*ئەگــەر بینــی لاپەڕەیــەکی پێــدراوەو پارچــــەیەکی لــــوولکراوی تێدایــــە دووگیاندەبێ.

*ئەگەر تەماشی لاپەڕەیــەکیکرد بــەڵام نەیخوێنــــــــدەوە میراتیەکــــــــە بەدەستیدەهێنێت.

*ئەگەر بینی لاپەڕەیەك دەخوێنێتــەوە میراتییــەکی بــۆ دەمێنێتــەوە، ئەگــەر پــشتی لاپەڕەکــەی خوێنــدەوە قــەرزی لەسەر کۆدەبێتەوە.

*بینینـــی لاپـــەڕەی پـــەرش وبڵاو لەقیامەتــدا بەڵگەیــە لەســەر دڵنیــایی و دانانــان بــەوەی لەلایــەن خــودای بــاڵاوە هــاتوە لەســەر زوبــانی پێغەمبــەرو(ﷺ) پەرچدانەوەی گومان و دوودڵی.

**لاجــانگ:**(نابلــسی) دەڵێــت: هــەردوو لاجــانگ دووکــوڕی ڕێــزدارو پــیرۆزن، ئەگــەر ڕووداوێکــی خێــر یــا شــەڕ رووی تێکــــردن ڕووداوێکــــە ڕوو لەهــــەردوو کوڕدەکات.

*دەگــونجێ لاجــانگ بەڵگــەبێت لەســەر چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

*ئەگەر نەخۆشێك بینــی لاجــانگی بــوە بەئاسن و لەکاتی بێداریدا ئێش و ئــازاری هەبوو بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی.

*دەگونجێــــت بــــەماڵ و ســــامان لێکبدرێتەوە.

*ئەگەر بینــی لاجــانگی کەسێکی تــری هەڵکێــــشا هــــەڵکێش مــــاڵ و دارایــــی لەلاجانگ هەڵکێشراو وەردەگرێ و خۆی پێدەنوێنێت.

*هــــەروەها دەڵــــێن: ئەگــــەر قــــژی هەڵبکێــــشێ ئەگــــەر دەوڵەمەنــــدبوو ماڵ وســــامانی نامێنێــــت، ئەگــــەر هەژاریشبوو قەرزەکەیدەداتەوە.

**لاحــول ولا قــوە الا بــالله (هــیچ پــەناو هێزێــك نییــە بــەدەر لە پــەروەردگار):**

(نابلسی) دەڵێت: بۆ کەسێك زۆربڵێ بەڵگەیە لەسەر ئاگاداری دەربارەی ئەوەی پێویستدەکات بیڵێ بۆی، هەروەها گەڕانەوە بەڵگەیە لەسەر ئاگاداری دەربارەی ئەوەی پێویستدەکات بۆی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گەڕانەوە لەکاتی بەڵاو نەهامەتیدا.

**لاسایی و چاولێکردنی ژن لە پیاو:**

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر ژنێکی بینی جلوبەرگی پیاوی لەبەردایە یان وەك ئەوانە، حاڵوباری باشدەبێت ئەگەر بەئەندازەی خۆی بێت ئەو جلوبەرگە، خۆئەگەر جلوبەرگێکی ناشیاوبێت ئەوا حاڵوباری دەگۆڕێت و غەم دایدەگرێ و ترس وبیم دێت بەسەریا.

* ئەگەر بینی بوە بەپیاو باش و چاکدەبێت بۆ مێردەکەی.

* لاساییکردنەوەی جولەکەو مەسیحیەکان یان بەدەر لەوان بەڵگەیە لەسەر تامەزرۆبوونی حەزو ئارەزوو یان ئارەزوودارکردنی ئاینەکەیان یاخود داوای هاوسەرگیریکردن لێیان یاخود خۆشحاڵبوون بەجەژنەکانی ئەوان.

**لاساییکردنەوەی مرۆڤ بۆ ئاژەڵ و باڵندە:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر لاساییکردنەوەی گوتەو قسەو دڵودەروون کەمەندکێشکردن لەپێناوی چاکسازی لەنێوان خەڵکیدا.

* لاساییکردنەوەی بەدەستو پەنجە لەخەودا لەبەر ڕووناکیدا بەڵگەیە لەسەر چاوداگرتن و فرتوفێڵ.

* لاساییکردنەوە بۆ خەڵکی ئاسایی و ژنان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەبێ بەوەرگێڕ یان زۆر قسەدەبزرکێنێ.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ناپاکی لەپیشەسازی و کاسەلێسی بۆ خەڵکی.

**لافاو( لێشاو ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەڵسانی لافاو لەشاردا بەڵگەیە لەسەر کەوتنەوەی پەتاو نەخۆشی ئەگەر ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێن و لێڵیبوو.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاتنی سەرباز بەدڵنیایی یان هاوەڵایەتی ئەگەر خەڵی لێی نەترسن، ئەگەر هەندێك لەماڵەکانی ڕووخاندن و ماڵو ئاژەڵی بردن دوژمنێکە هەڵدەکوتێتەسەریان ، یاخود دەستەڵاتدارێکە هەڵمەتیان بۆ دەبات بەپێی زیادوکەمی خەونەکەو ئەو بەڵگانەی لەکاتی بێداریدایە.

* هەندێکیتر دەڵێن: لافاو هێرشی دوژمنە، هەروەك چۆن هێرشی دوژمن لافاوە، ئەگەر لافاوەکە هەڵسا تاگەیشتە فرۆشگاو دوکانەکان لافاوی

راستەقینەیە یاخود سەربازی دەستەلآتدارنو ستەمدەکەن.
*لافاو دوژمنێکی زاڵە، ئەگەر بینی بەهۆی بارانەوە لافاو هەڵسا غەمو پەژارەی دەڕەوێتەوە.
*ئەگەر ئاوەڕۆی هەبوو سزای بۆ دادەبارێ.
*ئەگەر بینی بەربەستی دانا لەلافاوەکە هەتا نەگاتە ماڵەکەی چارەسەری دوژمنێک دەکاتو ڕێگەینادات زیانی پێبگەیەنێت.
*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: بینیم لەخەودا بێباران لافاو هەستابوو، خەڵکی ئاویان لێدەبرد، (ئیبن سیرین) وتی: لێی مەبە، پیاوەکەش وتی: من لەو ئاوەم نەبرد، ئەویش وتی: باشتکرد زۆری بەسەراتێپەڕنەبوو فیتنەو ئاشوبی (ئیبن مهلب) بەرپابوو.
(نابلسی) دەڵێت: لێشاوو لافاو بەڵگەیە لەسەر قسەی هەڵەتو بێسەرو درۆکردن، ئەگەر لافاوەکە خوێنو مردارەوەبووی هەڵگرتبوو بەڵگەیە لەسەر سزاو خەشمی خوایی.
*بینینی لافاو بەڵگەیە لەسەر دابارینی باران.

*دەگونجێت لافاو بەڵگەبێت لەسەر زوبانی خاوەنەکەی یاخود دوژمنی زاڵو زماندرێژی ئەگەر چوە نێو ماڵەکەی بەتایبەتی.
*دەگونجێت لێشاوو لافاو بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی دەچۆڕێتەوە لەهەنگوینو شیرو زەیت، ئەگەر بینی لافاو کۆدەکاتەوە دەیکاتە دەفرێکەوەو خەڵکی خۆشحاڵدەبن پێی چاودێریدەکەنو لێیدەخۆنەوە دەچێتە دەروازەی بەهانە وەرگرتنەوە کەئامازەمان پێدا.
*دەگونجێت لافاو بەڵگەبێت لەسەر ڕێبڕینو هەڵکوتانە سەری لەلایەن تێکدەرو شەوکوتەوە یان لەلایەن ئاژەڵی دڕندەوە.
*دەگونجێت لافاو گەر لەکاتی خۆیدا نەبێت بەڵگەبێت لەسەر بیدعەو، ئەو ئاوەی زەوی نغرۆدەکات بەڵاو نەهامەتیبێتو زیانبێت روو لەخەڵکیبکات یاخود دوژمنێك ڕوویان تێبکات یان بەڵاو نەهامەتی بێت ڕوو لەزەوی بکات، ئەگەر بینی ئاو لەئاسمان دێتە خوارەوە فەڕو خێرە بۆ خەڵکی.
*ئەگەر بینی لافاو دێتە نێو ماڵی کۆمەڵێکەوەو ماڵو سامانو ئاژەڵەکانی

بردن دوژمنه هه‌ڵده‌کوتێته‌سه‌ریان یان به‌ڵاو نه‌هامه‌تییه دێت به‌سه‌ریاندا.

*هه‌موو ئاوێکی زاڵ هیچ خێرێکی تیانییه ئه‌وه‌ی له‌بیر به‌رزده‌بێته‌وه‌و ده‌ڕژێ یان له‌رووبارێك له‌شوێنێکی نادیار یاخود گه‌رلێڵبوو یاخود روون‌و سازگابوو که‌م یان زۆربوو هه‌مووی غه‌م‌و په‌ژاره‌یه.

*هه‌موو ئاوێکی که‌می سازگار ترسی نه‌بێت ژینێکی خۆشنوده بۆ که‌سێك بیبێته خاوه‌نی یان بیخواته‌وه یا به‌ده‌ستیبهێنێت.

*لافاو له‌زستاندا به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌یه‌کی سه‌رپێچیکار که‌هیچ زانیاری‌و شاره‌زاییه‌کیان نییه‌و خراپن.

*ئه‌گه‌ر بینی له‌و ئاوه به‌مه‌له هاته‌ده‌ره‌وه بۆ وشکانی له‌ده‌سته‌ڵاتدارێکی سته‌مکار ده‌ربازده‌بێت، ئه‌گه‌ر نه‌یتوانی بیه‌ڕێته‌وه‌و گه‌ڕایه‌وه دواوه باوریا بێت له‌به‌رده‌ستی ده‌سته‌ڵاتدارێکی سته‌مکاردا دانه‌نیشێت‌و سه‌رپێچی گه‌وره‌که‌ی نه‌کات.

*ئه‌گه‌ر لافاو گه‌یی به‌ماڵه‌که‌ی‌و نه‌یهێشت بگات پێی له‌گه‌ڵ دوژمنه‌کانیدا ئاشته‌وایی به‌رپا ده‌کات‌و له‌زه‌ره‌ر ده‌یپارێزێ.

*هاتنی لافاو بۆ شار به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر به‌ڵاو نه‌هامه‌تی ئه‌گه‌ر خه‌ڵکی له‌وێدابوون یاخود ره‌نگی وه‌ك ره‌نگی خوێن وابوو یالێڵبوو.

**لاکردنه‌وه له‌نوێژدا( سه‌یری ئه‌ملاونه‌ولاکردن ):**

(نابلسی)ده‌ڵێت: ئاوڕدانه‌وه له‌نوێژدا به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر رووکردنه دنیاو خۆشیه‌کانی‌و پشتکردن له‌قیامه‌ت‌و خۆشیه‌کانی‌و حه‌زو ئاره‌زوو یه‌کانگیربوون له‌گه‌ڵ ئاره‌زووداراندا.

**لاله‌نگی ـ نارنج:** (ئیبن سیرین) ده‌ڵێت: یه‌ك لاله‌نگی کوره‌و زۆریش پیاهه‌ڵدانی باش‌و چاکه، هه‌روه‌ها ده‌گێڕنه‌وه پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) فه‌رموویه‌تی: "باوه‌ڕداری قورئانخوێن وه‌ك لاله‌نگی وایه بۆن‌و تامی خۆشه"[1].

*هه‌ندێك ده‌ڵێن: نیشانه‌و به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر دووڕوویی چونکه دیوی ده‌ره‌وه‌ی جیاوازه له‌دیووی ناوه‌وه‌ی.

*هه‌ندێکی دیده‌ڵێن: نارنج‌و لاله‌نگی باشن له‌خه‌ودا ئه‌گه‌ر شیرینبوو به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ماڵ‌و داراییه‌کی جه‌م‌و

---

[1] بوخاری گێڕاویه‌تیه‌وه (٥٤٢٧)و موسلیم له‌(مسافرين (١/٢٤٢/٥٤٩) له‌(أنس)ه‌وه ـ ره‌زای خوای لێبێت ـ .

کۆکراو، خۆئەگەر ترشبوو بەڵگەیە لەسەر سووکە نەخۆشیو خەمو پەژارەیەك کەلە وەچەی نێرینەوە پێیدەگات.

*نارنجی سەوز بەڵگەیە لەسەر وشکە ساڵ یاخود بەڵگەیە لەسەر تەندروستی خەوبینەر گەر لێیکردەوە.

*نارنجی زەردیش بەڵگەیە لەسەر ساڵی پڕ خێر بەلام نەخۆشی لەخۆگرتووە.

*نارنج ژنێکی عەجەمی بەڕێزی دەوڵەمەندە، ئەگەر خەوبین نارنجەکەی لەخەوەکەیداکرد بەدووکەرتەوە لەوژنە کوڕو کچێکی نەخۆشیدەبێت.

*ئەگەر ئافرەتێك لەخەودا تاجەگوڵێنەیەکی لەسەری خۆیدا بینی لەداری نارنج دروستکرابوو پیاوێکی دینداری بەناوبانگ دەیهێنێت *ئەگەر نارنجێکی لەکۆشیدا بینی کوڕێکی پیرۆزیدەبێت..

*ئەگەر پیاوێك لەخەودا بینی ژنێك نارنجێکی دەداتێ کوڕیدەبێت.

*ئەگەر بینی نارنج دەگرێتە پیاوێکیدی ژنو ژنخوازی داوادەکات لێی.

*نارنج بەدەر لەلالەنگی لەشتە باشەکانە ، بەلام هەندێك بەهۆی ناوەکەیەوە بەخراپیان داناوە.

*لالەنگی وەك باوەڕدار وایە لەبۆنو تامو بەرداری درەختەکەیداو زەردی زیانی نییە ، هەرکەسێك یەکێكو دووانو سیان بەدەستبهێنێت منداڵی نێرینەی دەبێتو ژمارەیەکی زۆریش ماڵو دارایی حەلاڵە لەگەڵ ناوبانگی چاك.

*لالەنگی سەوزیش باشترە لەزەرد، دەگونجێت یەك دانە ماڵو دارایی بێتو ئەگەر بیخواتو بەتامبێت ماڵو داراییەکی جەمو مۆڵکراوبێت، ئەگەر ترشبێت نەخۆشیەکی سووكو ئاساندەگرێت.

(نابلسی) دەڵێت: لالەنگی لەخەودا بەڵگەو نیشانەیە لەسەر ئافرەتی پیرۆزی مناڵدار یاخود رەگو رەچەڵەکی پیرۆز، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر باوەڕدار یا قورئانخوێن، بەڵگەشە لەسەر زانستو رەفتارو نەوازشی جوانو قەشەنگ، هەروەها دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆشەویستیو رامبوون.

*هەندێکیش دەڵێن: بەڵگەو نیشانەیە لەسەر دووڕوویی چونکە دەرەوەی جیاوازە لەناواخنی.

**لالی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لالی تێکچوونو شێوانی ئاینو بوهتانەو

بەڵگەیە لەسەر جنێودان بەیاران لەگەڵ غەیبەتی بەڕێزو شکۆمەندان.
*ئەگەر بینی زمانی گیراوە رەوانبێژیو فیقهی دەستگیردەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسَانِي ، يَفْقَهُوا قَوْلِي﴾(طـه: ٢٧ ـ ٢٨) لەگەڵ رزقو رۆزیو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا تێکچوونی ئاینو بوختان هەڵبەستنە، ئەگەر بینی لاڵبوە جنێو بەیاران دەدات یاخود غەیبەتی پیاوماقوڵو رێزداران دەکات یان خراپەکارە.
(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر زماندرێژیو دەستنوقاندن.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رژدیو وازهێنان لەنوێژ.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر قسەی ناشیرین لەنێوان موسوڵماناندا.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تۆڵەسەندنەوە یان داوای قەرز یاخود سکاڵا کەپێویستی بەدادوەردەبێ.
**لانە( هێلانە )**: (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر کوڕی زینا یان مزگەوتی خواناسە گۆشەگیرەکان.
**لاو( گەنج )**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر شانسو رازیبوونو سەرکەوتن ەسەر دوژمناندا بەپێی چیرۆکەکەی (ئیبراهیم)(سەلامی خوای لێبێت) چونکە بتەکانی شکاندو لەتلەتیکردنو پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ﴾ (الأنبياء: ٦٠).
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر دژایەتی خراپەکارانو زاڵبوون بەسەریاندا.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەجێهێنانی پێداویستی چونکە لەکەلەپورو وتەی دێریندا هاتوە:"لەبۆ بەجێهێنانی پێداویستیەکانتان رووخسارە گەشەکان بەگەڕ بخەن".
*ئەگەر بینی کاڵتە لەگەڵ لووسکەیەکدا دەکات یاخود زۆری لێدەکات کارێکی خراپ روو لەخۆیدەکات.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا دوژمنی پیاوە، ئەگەر سپیبێت دوژمنێکی شاراوەیە، ئەگەر ئەسمەربێت دوژمنێکی دەوڵەمەندە، ئەگەر کەنمرەنگبێ دوژمنێکی پیروپەککەوتەیە، ئەگەر بەهێزبوو دژایەتیدەکرێ.

*ئەگەر بینی دوای لاوێککەوت زەفەر بەدوژمنێکدەبات، ئەگەر لاوێك دوایکەوت دوژمنەکەی زەفەری پێدەبات.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر لاوێکی نادیاری بینیو رقی لێبوو دوژمنێکی قێزەونی بۆ دەردەکەوێ، ئەگەر خۆشیویست دوژمنێکی خۆشەویستی بۆ دەردەکەوێ.
*ئەگەر لاوێکی بینی بەدیار خۆیەوە دوژمنێکە زاڵدەبێت بەسەریا بەهۆی بەرزیو بڵندییەوە.
*ئەگەر بینی بوە بەلاو خۆشی پیربوو کەمو کورپییەکی گەورە دێت بەسەریا.
*لاوی باڵغ دوژمنە چونکە ئەگەر باڵغبوو گوێناگرێ بۆ گوتەی ئەوەی فەرمانبەرداریدەکات.
*لاو فروفێڵو ناپاکییە یاخود دوژمنێکی ناقۆڵایەو بینینی بەڵگەیە لەسەر جموجوڵو هێزو زاڵبوونی نەزان.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نیعمەتو سوپاسگوزاری پەروەردگار.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر کچێکی بینی خۆی جوانکردوەو موسوڵمانە هەواڵێکی خۆشدەبیستێ لەلایەکەوە هیچ پێشبینییەکی بۆ نەکردوە، ئەگەر بێباوەڕبوو هەواڵێکی خۆشدەبیستێ لەگەڵ نیگەرانیدا.

*ئەگەر کچێکی رووخسارکرژو مۆنی بەدیکرد هەواڵێکی ناخۆشدەبیستێ.
*ئەگەر کچێك کچێکی لاوازی بینی غەموپەژارەو هەژاری رووی تێدەکات.
*ئەگەر کچێکی بەرووتی بینی لەبازرگانیەکەیدا زەرەردەکاتو ئابڕوویدەچێت.
*ئەگەر بینی کچێکی هێنا زەوییەکی دەستگیردەبێتو بازرگانیەکی بەسوود دەکات.
*کچ خێرە بەئەندازەی جوانیو جلوبەرگو پۆشاکی، ئەگەر داپۆشراوبوو خێرێکی هەلگیراوە لەگەڵ ئاینا، ئەگەر رووتبوو خێرێکی دیارو بەناوبانگە ئەگەر پەچەی بەستبوو ئەوە خێرێکی تێکەڵو پێکەڵە ، ئەگەر دیاربوو خێرێکە بڵاودەبێتەوە، پێگەیشتووش خێرێکی خوازراوە.
*ئەگەر ژنێکی شۆخو شەنگی بینی دێتە نێو ماڵەکەی خۆشیو شادی رووی تێدەکات.
*ژنی شۆخو شەنگ ماڵێکە نامێنێتەوە چونکە جوانی گۆڕانی بەسەردادێت.
*ئەگەر بینی ژنێکی شۆخو شەنگ بەرووخساری رووی تێکرد

کاروبارەکانی بۆ دێتەپێش دوای پشتتێکردن‌و لەکیسچوون.
*ژنێکی عەرەبی نادیاری لاوی رازاوە باسی خێرو سوودو قازانجی لەلێکدانەوەدا فراوان‌و دووورودرێژە.
*ژنی قەڵەو لەلێکدانەوەدا ساڵێکی پڕفەڕو خێرە، ژنی لاوازیش قات‌و قڕییە.
*باشترین ژن لەلێکدانەوەدا ژنی عەرەبی نادیارە، چونکە لەجوانکاریدا یان لەشێوەدا باشترە لەژنانیتر.
*ئەگەر ژنێك لەخەودا ژنێکی لاووگەنجی بینی دوژمنیەتی بەهەر حاڵێك بەدیبکات، ئەگەر پیرێکی بینی داپیرەیەتی.
(نابلسی) دەڵێت: بۆ ژن لەخەودا دوژمنە ئەگەر بەهەر حاڵ‌و بارێك بەدیبکات.
*کچی جوان‌و شۆخ خێروخۆشی‌و شادییە، ژنانی نادیار باشترە لەهی دیار.
*ئەگەر ژنێکی لاوو جەحێل ببینێ بوە پیرەژن خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر باشی ئاینەکەی.
*ئەگەر پیرەژنێك بینی گەنجبوەتەوەو هێزو توانای بۆگەڕاوەتەوەو دەدرێت بەشوو بنەماکانی ئاینی بەهێزو پتەودەبێ ئەگەر مارەبڕینەکە حەلاڵبێت، ئەگەر حەرامبوو دنیایە بەو ئەندازەیە.
*ئەگەر پیرێکی بینی لەخەودا گەنجبوەتەوە، ئەگەر هەژاربێت دەوڵەمەند دەبێ، ئەگەر لەوانەبوو دنیا رووی لێوەرگێڕابوو دیسان رووی تێدەکاتەوە، ئەگەر نەخۆشبوو لەنەخۆشییەکەی چاکدەبێتەوە.
**لاوازی( سیسی )**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: کەم‌و کوڕی ماڵ‌و سامان‌و حاڵ‌و بارە.
(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر نزمی ئاست‌و پلە، ئەگەر لاوازەکە فەرمانڕەوابوو بەڵگەیە لەسەر قات‌وقڕی ئەو ساڵەو بەرزبوونەوەی نرخەکان لەولاتەکەیدا یان لاوازی سەربازەکانی.
*هەروەها گوتراوە: لاوازی‌و سیسی نەخۆشییە یاخود برسێتییە.
*دەگونجێت لاوازی لەعیشق‌و غەم‌و پەژارەوەبێت.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا هێزە، ئەگەر بینی لاوازە بەهێز دەبێت.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی لەشولاری لاوازە ئاینی لاوازو سستدەبێت تێدا یا لەو قەرزەدا کەخودا داینناوە لەسەری

کەموکوڕیدەکات، هەروەها دەڵێن: لاوازی لەخەودا کەم ئارامییە لەمارەبڕیندا بەپێی ئایەتی: ﴿وَخُلِقَ الْإِنسَانُ ضَعِيفًا﴾ (النساء: ٢٨) واتە ئارامناگرێ لەسەر جووتبوون.

* ئەگەر بینی لەشولاری لاوازە غەمو بەژارە رووی تێدەکات.

**لولاو**[1]: (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی باشە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی نەفسی پاكو پوختدەبێ بەوەی سوودی لێوەردەگرێ.

* لاولاو رەوشتی خراپو هەولێ سووكو نزمە.

**ل س**

**لستنەوە(لێسانەوە)**: لێسانەوەی پەنجەکان لەخەودا رزقێکی کەمە لەکرۆکی ئەوەیە کەلەخەودا لێسراوەتەوە.

**ل غ**

**لغاو**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا رێکخستنەوە بۆ هەموو خاوەن پیشەسازییەكو هێزو توانایە لەماڵدا.

* ئەگەر سواری بارگیرێکبوو بەلغاوەوە دەستەلاتێك بەدەستدەهێنێو هیچکەس مافی نییە خۆی تێهاوێ مەگەر بەسوێندێکی گەورەو توند نەبێ.

* لغاو بێ خشلێ بەڵگەیە لەسەر خۆبەکەمزانینی سورابوو، ناواخنی خێرترە لەرووخساری.

* لغاو سەلامەتییە ئەگەر بینی لغاوی لەدەمدایە پارێزراو دەبێو قسە لەشتێکدا ناکات پەیوەندی پێوە نەبێ، ئەگەر دادگایی هەبوو بەڵگەکانی پووچەڵدەبێتەوە.

* ئەگەر لغاوی ئەسپەکەی بینی پچڕاوە منداڵەکەی دەمرێ.

* هەروەها لغاو بەڵگەیە لەسەر پارێزکاری بۆیەکێك ئەسپ بەڵگەبێت لەسەری.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پاككردنەوەی ماڵو دارایی کەهۆکاری پاراستنی زەکاتە.

* ئەگەر لغاوی ئەسپەکەی بینی لەسەری دەکەوێتەسەر یاخود کاروبارەکانی بڵاودەبنەوەو حاڵی دەشێوێو ژنەکەی لێحەرامدەبێ یاخود بێنەوەی لەئەستۆیدابێت لەگەڵیدەبێ.

---

[1] لاولاو: گیایەکی کەلاپانە. (وەرگێڕ).

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ڕۆژو چونکە ڕۆژو لغاوە.

*لغاوی پچڕاو باشە بۆ پادشاکانو خێری تێدا نییە بۆ خاوەنەکەی.

## ل ق

**لقو پەلی دارخورما:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پاکیتی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قەرزداهێنانو ئەوەی منداڵ سوننەتدەکات.

## ل م

**لم:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لم وەك خاكو خۆڵ وایە لەلێکدانەوەدا بەڵگەیە لەسەر مەرگو ژیانو دەوڵەمەندیو لانە، چونکە لەزەوییەوەیە.

*چوونی قاچ بەنێولمدا بەڵگەیە لەسەر توندیو سووکی.

*ئەگەر بینی دەستی چوە بەنێو لمدا کاروباری دنیای لێئاڵۆزو تێکەڵدەبێ.

*ئەگەر بینی لمەکەی کۆکردوەتەوە یاخود هەڵیگرت ماڵو دارایی هەڵدەگریو سوودو قازانجی باشدەکات.

*ئەوەی بەنێو لما بڕوات ڕووداوێکی قورس چارەسەردەکات بەپێی زۆرو کەمی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵو داراییە ئەگەر زۆر نەبێت، لمی زۆریش سەرقاڵییە لەئاینو دنیادا.

*ئەگەر لمەکە زۆربووو زیادیکرد لەلێکدانەوەدا سزایە.

*لم ماندوبوونو ڕەنجو ناڕەحەتییەو بۆ ژن خێری تیانییە، ئەگەر بەنێویا بڕوات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر خۆڵاوییبوونی، هەروەها بۆ پیاویش بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەی شکۆمەند بۆ کەسی بێکارە، لمی سپی ڕزقو ڕۆزییە بۆ خوازیاو وادەدارو ئەستێرەگەران.

*لمی زەرد دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تەوبە بۆ نەخۆشو چارەنووسو دەرەنجامی باش.

*دەگونجێت هەڵگرتنی بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشیو زیندانیو ڕزقو ڕۆزی بەهۆیەوە.

*لمی جەمبووی بنکیدارو درەختو ڕووەك بەڵگەیە لەسەر زرقو رزۆیو مولك.

**لمفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەستبڕینو دزیو هێنانی خزمەتکار بەردەستو سوودو قازانجو سەفەر.

## ل و

**لــــوط(ســــه‌لامی خوای‌لێبێـــت)**:

(نابلـسی)ده‌ڵێــت: بینینــی له‌خــه‌ودا به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر غه‌مو په‌ژاره له‌نه‌ته‌وه‌و هاوسه‌ره‌که‌یه‌وه، ده‌گونجێت خه‌وبینه‌ر سه‌ربکه‌وێت به‌سه‌ر دوژمنه‌کانیداو سزاو خه‌شمی خـوایی له‌به‌رامبه‌ریانـدا بـه‌دی بکات.

* هــه‌روه‌ها بینینــی به‌ڵگه‌یــه له‌ســـه‌ر تیابردن‌و نغرۆکردن ئه‌گه‌ر خه‌ڵکه‌که‌ی له‌ســـه‌ر هـــه‌مان کـــاری نه‌تـــه‌وه‌ی (لوط)بوون.

* ئه‌گه‌ر ژنێك (لـوط)ی بینـی له‌خـه‌ودا له‌سه‌رپێچدا رۆده‌چێت.

* ئه‌گه‌ر سه‌رجه‌م خه‌ڵکی بینیان خراپه لـــه‌نێوان ژنانـــدا بلاوده‌بێتـــه‌وه‌و له‌وولاته‌دا.

* ئه‌گه‌ر (لوط)ی بینـی ئاگادارییه بـۆی له‌ســـه‌ر ئـــه‌وه‌ی کـــرداری نه‌تـــه‌وه‌ی (لـــوط)ئه‌نجامـــده‌دات‌و ژنێکـــی خراپه‌کاریشی ده‌بێ‌و هیچ خێرێکی تێدا نییه.

## ل وو

**لووت** : (ئیبن سیرین) ده‌ڵێت: سه‌باره‌ت به‌لووت وتراوه: جوانی پیاوه، هه‌روه‌ها ده‌وترێـت: ئه‌گـــه‌ر بینـــی بێلووتبـــوو بێره‌حم‌و سۆزه.

* ئه‌گه‌ر بینی دوو لووتی هه‌بوو به‌ڵگه‌یه له‌ســه‌ر جیاوازییــه‌ك رووده‌دات لــه‌نێوان خـۆی‌و خانه‌واده‌کـه‌ی چـونکه لـووت غه‌ریب نییه.

* ئه‌گـــه‌ر بـۆنێکی خۆشـیکرد به‌ڵگه‌یـه له‌سه‌ر قوتاربوون‌و رزگاربوون.

* ئه‌گـــه‌ر ئـــه‌وه‌ی خه‌وه‌کـــه ده‌بینێـــت ژنێکی دووگیانبوو کوڕێکیده‌بێت.

* هــه‌روه‌ها ده‌ڵـێن: لـووت کـوڕه یـان پله‌وپایــه‌و ره‌چـه‌ڵه‌که یــاخود دایــك‌و باوکه.

* لێکدانـــه‌وه‌ی ئـــه‌وه‌ی په‌یوه‌نـــدیی به‌لووتـــه‌وه هه‌یـــه به‌هـــه‌مان چه‌شـــنی چاره‌ســـه‌رو ده‌رمـــان وایـــه، ئـــه‌و خراپه‌یه‌شی تێکه‌ڵی ده‌بێت رق‌و کینه.

* ئه‌وه‌ی ببینێ لمۆزی هه‌یه ره‌چه‌ڵه‌ك‌و بنه‌چه‌یه‌کی به‌هێزی ده‌بێت.

(نابلـسی) ده‌ڵێـت: لـووت هه‌سـتیاری بۆنکردنه‌و ئامرازی هێـوری‌و پـشوودانه به‌هۆیــه‌وه هــه‌وا ده‌گـات به‌لــه‌ش‌ولارو پێیده‌حه‌وێتـــه‌وه خۆشـــی هه‌ناســـه له‌خه‌ودا به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر پشوو.

* لـووت له‌خــه‌ودا به‌ڵگه‌یــه له‌ســه‌ر ئــه‌و شــته‌ی مــرۆڤ خـۆی پێده‌رازێنێتــه‌وه لــه‌ماڵ‌و منـاڵ‌و بـراو هاوسـه‌رو ژنـبراو هاوبه‌ش‌و کرێکار، ئه‌وه‌ی لووتی جوان بێـت له‌خــه‌ودا به‌ڵگه‌یــه له‌ســه‌ر حــاڵ‌و

بـاری بـاش هـەروەك لێـی دوایـن‌و باسمـانكرد، گـەورەیی‌و رەشـی لـووت بەڵگەیە لەسەر درۆ پێكـردن‌و زاڵبـوون، هـەروەك چـۆن شـێوازی سروشـتی لەهەڵمـژینی هـەوادا بەڵگەیـە لەسـەر پلەوپایەی بەرزو دڵڕاگرتن.

*بەدەركـەوتنی كۆمـەڵێ لـووت لەجەسـتەدا بەڵگەیـە لەسـەر نوێكردنـەوەی هۆكـاری پـشوو منـاڵ‌و شوێنكەوتە.

*ئەگەر بینی لـووتی بـوە بەئاسـن یـان ئـاڵتوون بەڵگەیـە لەسـەر بـەڵاو نەهامەتیـەك رووی تێـدەكات بـەهۆی تاوانێكـەوە ئەنجامیـدەدات، چـونكە تاوانبـاران لووتیـان دەبـڕن، كـاتێكیش گەڕانـەوەو تەوبـەیانكرد خۆیـان لـووت لـەئاڵتوون‌و ئاسـن دروسـتدەكەن لەترسی ناوبانگ‌و كەسێتیان.

*ئەگـەر خەوبینـەر بازرگـانبوو بینـی لووتی بوە بەئاڵتوون یان زیوو بەڵگەیە لەسەر بەخت‌و زۆری سوودو قازانجی.

*دەگونجێـت لـووت بەڵگـەبێت لەسـەر ئـەو هەواڵـەی دەگـات بـەمرۆڤ لەسـەر زوبانی فرستادە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسـەر سیخوڕ كەهـەواڵی وادەهێنێـت كـەس ئاگاداری نییە.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر قوتاربوون بەهۆی ئـەو چڵمەی لێـوەی دادەتەكێت، ئەگـەر مێشك بگرێ ئـەوا چـڵمی لـووت دەبێتـەوە بـەئاوو وەك ئەوەی لەجێشەرمی نێرینـە لەشێوەی ئاودا بەدەردەكەوێت.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر دەروازەی شەڕو خراپە بۆ مرۆڤ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئـامرازی ئاگر خۆشكردن كەبژێوی لەسەریەتی.

*ئـەوەی پـەمپی بـاتێكردنی دی لەكاركـەوتبوو دەگونجێت بەلایـەك روو لەلووتی بكات، هـەروەها ئەگـەر رووداو كارەسـاتێك روویكـردە لـووتی كـارو پیشەی دەكەوێتە مەترسیەوە.

*ئـەوەی قورئـانخوێن یـان بانگبێـژ یـا گۆرانیبێژ بێت‌و ببینـێ لـووتی شێواوە یان گیراوەو بۆن ناكات بەڵگەیە لەسـەر خۆشحاڵی‌و شادی لەپیشەكەیدا چونكە لـووت دەرهێنـەری هەناسـەیە، دەگونجێت خـەوبینەر نەخۆش بكـەوێت بەهۆی تەنگە نەفەسیەوە.

*دەگونجێـت لـوت‌و گـوێ بەڵگـەبن لەسـەر كێـوو بـەرزایی‌و كەنـدەڵانی كژوگیاپۆش‌و قوڕاویی.

*دەگونجێـت لـووت بەڵگـەبێت لەسـەر قوتاربوون‌و چارەسەری نەخۆش.

*هەروەها دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گێلیو کەودەنیو خۆبەزلزانینو زستانێکی خراپو نادیار.

*ئەوەی لووتی بێتەوەیەك خۆی بەگەورە دادەنێت یان ئەگەر لووتی لاربوو بەڵگەیە لەسەر گێلیو ملکەچی.

*ئەوەی ببینیٚ لووتیبڕاوە مەرگ یەخەی پێدەگرێت یاخود بەلاو نەهامەتیەك رووی تێدەکات ئابرووی دەبات، ئەگەر هاتو ئەو ژنە دووگیانبوو خۆی یان باوکی دەمرێت.

*ئەگەر بینی خوێنی بەربوو کەوتەسەر جلەکانی ماڵی حەرام بەدەستدەهێنێت، ئەگەر خوێنەکە بەتەوژمبوو کوڕێکی دەپێکریٚ.

*لووتەوانەکردنە لووت مەرگی خاوەنەکەیەتی.

*ئەوەی ببینیٚ دوو لووتی هەیە پەروەردگار دوو کوڕی پێدەبەخشێت یاخود گەواهیدانی لەبری گەواهی دووپیاوە.

*ئەوەی ببینیٚ لووتی بڕاوە ئەگەر نەخۆشبێت بەڵگەیە لەسەر مردنی، ئەگەر لەش ساغیشبێت بەڵگەیە لەسەر گۆڕانی حاڵو باریو لەکیسچوونی ماڵودارایی.

**لووتبڕین:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی یەکێك لووتی بڕیوە قسەیەکدەکات بەرانبەری لووتی دەشکێنیٚ.

*هەروەها دەڵێن: لووت بڕین لەبنەڕەتدا بەڵگەیە لەسەر مەرگی لووتبڕاو، هەروەها دەڵێن: بەڵگەیەلەسەر مردنی هاوسەری لووتبڕاو ئەگەر دووگیانبێت.

*بۆ بازرگان زەرەرو زیانە.

**لووتپژاو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لووتپژاو ئەگەر خوێنی لووتی زۆربوو رەنگی خوێنەکە گەشو ئاڵبوو بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی ماڵێکی هەمیشەیی، ئەگەر خەستبوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی منداڵێکی لەباردەچیٚ.

*ئەگەر لووتی پژابوو لەناخیا واهەستیدەکرد سوودی پێدەگەیەنیٚ لەسەرۆكو بەرپرسەکەیەوە سوودو قازانجی پێدەگات، ئەگەر واهەستیکرد زیانی پێدەگەیەنیٚ لەسەرۆكو بەرپرسەکەیوە خێرێکی پێدەگات بەلام واهەستدەکات، ئەگەر خۆی سەرکردەبوو بەلەشو لاری خۆیەوە دەیبینیٚ بەئەندازەی هێزو لاوازیو زۆری خوێنەکەیە، ئەگەر یەك تنۆك یان دوو تنۆك خوێنبوو سوودو قازانجە،

ئەگەر بەلێشاو خوێنی پژاروو واهەستیکرد سوودو قازانجە بۆ لەش‌ولاری، تەندروستی لەش‌و لار تەندروستی ئاینەو لەگوناهو تاوانێك دەردەچێ‌و ئاینەکەی دروستدەبێت.

*ئەگەر لەناخ‌و ویژدانیدا واهەستیکرد زیانی پێدەگەیەنێ خراپی‌و زیانی لاشە خراپی زیانی ئاینە یاخود گوناهو تاوانە، ئەگەر دوای لووتپژان هێزو توانای نەما هەژاردەکەوێ، ئەگەر بەهێزبوو دەوڵەمەنددەبێت چونکە هێز دەوڵەمەندییە بۆ پیاو.

*ئەگەر پۆشاك‌و جل‌وبەرگی خوێناویبوو لەوەوە ماڵێکی خراپ‌و گوناهی دەستگیردەبێت، ئەگەر جلەکانی خوێناوینەبوو خاوەنەکەی لەبۆتەقەی گوناهو تاوان قوتاردەبێت.

*ئەگەر بینی لووتپژان لەرێگەدا تنۆك تنۆك دەڕژێ زەکاتی ماڵ‌و دارای دەردەکات‌و خێردەکات بەوانەی دێنەرێی.

*هەروەها دەڵێن: لووتپژان بەدەستهێنانی گەنجینەیە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لووتی پژا لەگوناهو تاوان بەدەردەکەوێ، ئەگەر دەستەلاتدارێکی ستەمکار خەونێکی ئاوای بینی گەنج‌و ماڵێکی بێشومار بەدەستدەهێنێت.

*هەروەها دەڵێن: لووتپژان خێرێکە لەلایەن سەرۆك‌و گەورەوە بەدەستیدەهێنێت.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارەو ئاهو ناڕەحەتی لەلایەکی نادیارەوە.

*ئەگەر خەوبینەر بەلووتپژان چێژی وەرگرت لووتپژانی بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی‌و ناوبانگ‌و ناوداری.

**لوولەی چرا:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا خزمەتکاری مزگەوتەو هەر کەم‌و زیادێك ببینێ بیدەپاڵ خزمەتکار. سەری منارەکەش سەری خزمەتکارەو دەگونجێت منارە ژنبێت.

## لۆ

**لۆکە:** (نابلسی) دەڵێت: ماڵ‌و سامانێکە بەدەر لە خوری‌و شیکردنەوەی پاکبوونەوەیە لەگوناهو تاوان، لۆکە سوننەتەو دارەکەی کەسێکی خۆبەکەمزانە.

**لۆکەفرۆش:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەخەودا ماڵ‌و سامانە بەماندبوون‌و هیلاکی دەستدەکەوێ.

**لۆمە (سەرزەنشت):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی لۆمەو

سەرزەنشتی کەسێکدەکات لەسەر کارێك هەمان کاری ئەو ئەنجامدەدات.
*ئەگەر بینی لۆمەی خۆیدەکات لەسەر کارێك روودەکاتە کارێکی ئالۆزو گلەیی لەسەر دەکرێ، پاشان خوداوەند بەدەریدەکاتو پاکێتی دیاریدەدات وەك چۆن لەچیرۆکی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت) هاتوە:﴿إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلاَّ مَا رَحِمَ رَبِّيَ﴾(یوسف:٥٣).
(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر دواکەوتنی شەیتان لەزوربەی کردارەکاندا کەوا مەردوم روو بەدۆزەخ دەبات، هەروەها بەڵگەیە لەسەر نەبردنەسەری بەڵێن بەپێی ئایەتی: ﴿وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الأَمْرُ إِنَّ اللهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ﴾(ابراهیم:٢٢).

## ل ە

**لەئامێزگرتن:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: تێکەڵبوونو خۆشەویستییە، ئەگەربینی لەئامێزی گرتو سەری خستەسەر رانی سەرمایەیەکی پێدەداتو لای دەمێنێتەوە.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی، ئەگەر مرۆڤێکی ناسیاوی لەئامێزگرت تێکەڵدەبێت لەگەڵی.
*ئەگەر لەگەڵ ژنەکەی یەکدییان لەئامێزگرت ئاشتی لەگەڵ دەبەستێ.
*هەروەها گوتراوە: لەئامێزگرتن قسەیەکی باشە لەگەڵ وەلامی هاوچەشنی خۆی.
*هەروەها تەبایی و خۆشەویستیو سەفەرە یان گەڕانەوەی موسافیرو رەواندنەوەی غەمو پەژارەیە.
*هەروەها مارەبڕین تێکەڵییە.
*ئەگەربینی ژنێکی لەئامێزگرت باوەشی بەدنیادا کردوەو نائومێدە لەقیامەت.
*لەئامێزگرتنی پیاو بەڵگەی یارمەتیو پشتگیرییە.
*لەئامێزگرتنی کۆتەرەدارێك رۆچوونیەتی لەدوورووییدا.

**لەبارچوون:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کەسێکە بڕوای بەشتی پڕوپووچ هەبێت، هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گەوهەرفرۆش بەڵگەیەلەسەری لەبەردی بەنرخو دووروەرجانو هاوچەشنەکانی.

**لەپیدەست( بەری دەست ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: راخستنی لەپیدەست فراوانی دنیاو داخستنو تەنگەبەری دنیایە. بوونی موو بەلەپیدەستەوە

قەرزو غەمبارییە، هەروەها دەڵێن: ماڵو سامانێکە دەکەوێتە دەستی. موو بەپشتی دەستەوە ڕۆیشتنو تیاچوونی ماڵو سامانە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەپیدەستی هەڵواسراوە بەئاسماندا ئەگەر لەپەیوەندارانی دەستەلاتبوو خێرو سوودی دەستگیردەبێ، ئەگەر راوچی بێت نێچیری زیاددەکات، ئەگەر خاوەن موڵکبێت سوودو قازانجدەکات.
*ئەگەر بینی لەپیدەستی بچووکو ناسکە ترسنۆکو لاواز دەبێت.
*لەپیدەست دنیایە، لەپیدەست وازهێنانە لەکاروبار.
*ئەگەر لەپیدەستێکی بینیو ترسابوو لەکارێك دەستی لێدەکێشێتەوە.
*ئەگەر لەپیدەستی بینی گوشادو بەرینو زۆرجوانە بەڵگەیە لەسەر فراوانی رزقو رۆزیو دڵفراوانی، ئەگەر بەنوقاوی بینی بەڵگەیە لەسەر رەزیلیو کەمی خێری.
*ئەگەر لەپیدەستی جوانبوو بەڵگەیە لەسەر وازهێنان لەشەڕو سەرپێچی خودا یان وازهێنان لەخێر.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر وەرگرتنو گیرابوونی دوعا.

*لەپیدەست پشوە لەماندوبوون یاخود دۆزینەوەی پشووە یان پشوویەکە روودەکاتە دەستەکانی.
*هەروەها دەڵێن: بینینی دەست بەڵگەیە لەسەر شەش خاڵ:
١)ژیان. ٢)ماڵو سامان.
٣)سەرۆکایەتی. ٤)کوڕ.
٥)ئازایەتی. ٥)پەرێزگرتن لەحەرام.
**لەدایکبوون:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر فەرمانڕەوایەك لەخەودا بینی هاوسەرەکەی کوڕێکیبوو دووگیانیش نەبوو گەنجو سامان بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر دووگیانێك بینی کوڕێکیبوو کچیدەبێتو بەپێچەوانەشەوە.
*کچ لەلێکدانەوەدا دەرووی خێرەو کوڕیش غەمو پەژارەیە.
*ئەگەر نەخۆشێك بینی لەدایکبوە دەمرێ چونکە منداڵ لەپەڕۆیەکی سپییەوە دەپێچرێ وەك مردوو، ئەگەر پیشەوەربوو بەربەستو کۆسپ دێتە رێو کاریگەری دەبێت بۆ سەر کارو پیشەکەی، ئەگەر هەژاربوو کەسێك دەدۆزێتەوە یارمەتی دارایی دەدات، ئەگەر دەوڵەمەندبوو دەوڵەمەندییەکەی بەردەوام نابێتو کەسانیتر زاڵدەبێت بەسەریا چونکە منداڵ لەژێر دەستی کەسانی تردایە، ئەگەر پیاوێکی ژنداربوو هاوسەرەکەی منداڵی نابێت.

*ئەگەر ژنێکی دووگیان بینی هەرگیز کوڕی نابێ.
*ئەگەر کەسێك بینی دژایەتی هەبوو بەڵگەکانی جێگیر نابن لەلای دادوەر، ئەگەر بینی منداڵیبوو دەمرێ‌و ڕوحی لەدەمیەوە دێتە دەرەوەو لەدایکبوونی کە دەرووی خێری زیندانییە.
*ئەگەر پیاوێك بینی کوڕێکی بوو نەخۆشدەکەوێ‌و لەغەم‌و پەژارە قوتار دەبێت‌و زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیداو لەژنێکی خراپ‌و بەد ڕزگاریدەبێ.
*ئەگەر کچێکیبوو دەرووی خێری لەهەموو ناڕەحەتیەك لێدەکرێتەوەو لەپشتی کەسانێك دێنەدەرەوە کاروباری خانەوادەی بەڕێوە دەبەن‌و ناوبانگێکی مەزن بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر ژنێك ئاژەڵیبوو ئەگەر پشیلەبوو کوڕەکەی دز دەبێت.
*منداڵبوون دەرچوونە لەناڕەحەتی‌و دەرووی خێرەو قەرزدانەوەو تەوبەیە.
*ئەگەر ژنێك بینی منداڵێکیبوو لەدەرەنجامی کارەکەیدا خێری دەستگیردەبێ لەگەڵ خۆشحاڵی‌و قوتاربوون لەقورسی‌وگرانی، ئەگەر کچیبوو شکۆمەندی‌و فەڕو پیت‌و ئاسانی دوای ناڕەحەتی دەستگیردەبێت‌و ڕزق‌و ڕۆزییەکی فراوانی پیرۆزی بەسەرا دەرژێت، ئەگەر دەوڵەمەندبوو دەکەوێتەوە نێو غەم‌و پەژارەوە، ئەگەر ڕەبەنبوو بەخێرایی هاوسەردەگرێ هەتا ژنەکەی منداڵیدەبێ.
*ئەگەر نەخۆشێك بینی منداڵیدەبوو بەڵگەیە لەسەر مردنی‌و بۆ نەخۆش‌و بەلاداو زەبوون بەڵگەیە لەسەر قوتاربوون لەناڕەحەتی، بۆ بازرگانەکان بەڵگەیە لەسەر تیاچوونی ماڵ‌و سامانیان، بۆ موسافیرو گەشتیاران بەڵگەیە لەسەر سووکی کاڵاو شتومەکیان، هەروەها بەڵگەیە لەسەر مردنی خزمی خەوبینەر.
*ئەگەر پەتێکی بینی دەستیکرد بەگریان‌و پاڕانەوە کوڕەکەی قوتار دەبێت.
*ئەگەر بینی کچێکی بوە قەرزاری زاڵدەبێت بەسەریا.
*ئەگەر بینی کچەکەی مردوەو گۆڕیان بۆ هەڵکەندوە قەرزەکەی دەداتەوە.
**لەدواوە لێدان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لێدان ئەگەر بەکاڵتەوەبوو بەدەستهێنانی دەستەڵاتە لای لێدراو. (نابلسی) دەڵێت لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کاڵتەو سووکایەتی‌و کێشانە بەپێدانێکی سووك‌و گوێگرتن.

*ئەگەر مرۆڤێکی بینی لێیدا دەستەڵاتێکی هەیە بەسەریدا، ئەگەر پادشایەك لەپادشایەکیتریدا لێدراو زاڵدەبێت بەسەر لێدەردا لەبەرئەوەی دەستدرێژیکارە بۆسەری‌و ئەمەش لەرەوشی فەرمانڕەوایانە.

*لێدان چاکەیەکە بەرانبەر شەرمەزار دەکات.

**لەرزۆك (لەرێنەر):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا کوڕێکی ژیر یان منداڵی قوتابخانەیە.

**لەرزین:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەرزینی ئەندامەکان ناڕەحەتییە، ئەگەر لەرزەلەرزی لەسەریا بینی ناڕەحەتی‌و گرانی لەلایەن سەرۆکیەوە پێدەگات.

*لەرزینی کوڵم بەڵگەیە لەسەر ناڕەحەتی لەلایەن هۆزوتیرەوە.

*لەرزین لەهەردووقاچدا بەڵگەیە لەسەر ناڕەحەتی لەژیاندا یاخود بەڵگەیە لەسەر ماڵ‌و دارایی.

(نابلسی)دەڵێت: لەرزین لەسەردا بەدەستهێنانی شکۆمەندییە لەلایەن سەرۆك‌و گەورەوە.

*هەروەها دەڵێ: لەرزین لەکوڵمدا خێروچاکەیە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ترس‌و بیم لەخوداوەند.

**لەشساغی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی چونکە واژوو دژێتی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لەشساغی‌و نازو نیعمەتداری.

**لەشگرانی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی لەشگرانە لەخەودا سەفەردەکات‌و داوایەکدەکات بەرانبەری نییە.

*ئەگەربینی خۆیدەشوات پێداویستیەك بەدەستدەهێنێت، خۆشتنیش مەردوم لەگوناهو تاوان پاکدەکاتەوەو غەم‌و پەژارە دەرەوێنێتەوە.

(نابلسی)دەڵێت: لەشگرانی سەفەرە لەئەنجامدانی گوێڕایەڵیدا، هەروەها وتراوە: ئەوکەسە ئاینشێواوە.

*لەشگرانی تێکەڵبوونی کارو بارە بۆیەکێك ببینێ لەشگرانەو ئاوی دەستناکەوێت خۆی بشوات، هەروەها قورسی‌وگرانی داواکانیەتی لەدنیاو قیامەتدا.

**لەش‌و لاری مرۆڤ:** (نابلسی) دەڵێت: قەڵەویەکەی لەخەودا لەگەڵ هێزو پتەوی بریتییە لەبەهێزی ئاین‌و باوەڕ، ئەگەر لەش‌و لاری بوو بەمار دوژمنایەتی پەنهان بەدەردەخات.

*ئەگەر بینی خۆی دووگی هەیە وەك دووگی بەران خوداوەند کورێکی پێدەبەخشێ لەوەوە سوودمەند دەبێتو دەژی.

*ئەگەر لەش‌و لاری بووبوو بەئاسن یان شووشە دەمرێت.

*ئەگەر زیادەیەکی بینی لەلەش‌و لاریدا پەروەردگار رزق‌و رۆزی زیادی دەدات.

*ئەوەی ببینێ لەش‌و لاری دەخورێنێ یاخود هەڵدەکرێنێ خزمەکانی بەسەر دەکاتەوەو لەوانەوە تووشی چەرمەسەری‌و مەینەت دەبێت.

*ئەگەر بینی تووشی خوراندن هات‌و هەر دانەمرکایەوە مەینەت‌و ناخۆشی بەهۆی خانەوادەکەوە رووی تێدەکات، ئەگەر خورانەکە دامرکایەوە خێرێکی مەزن بەدەستدەهێنێت.

*قەڵەویی لەش‌و لاریش زیادەیە لەماڵ‌و پلەوپایەو شکۆمەندیدا، لەری‌و لاوازیش بەڵگەیە لەسەر هەژاری‌و کەمی ماڵ‌و داریی‌و زانست، کۆبوونەوەی هەردوو حاڵەکەش.

*قەڵەوی‌و لاوازی چاوپێکەوتن‌و یەکانگیریەتی لەگەڵ ئەوانەدا کەرقی لێیانە.

*لەش‌و لار لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+ئەوەی دایدەپۆشێ وەك جل‌و بەرگ‌و پۆشاك‌و ژن‌و خۆشەویست‌و ماڵ‌و منداڵ.

+ئەوەی خۆی پێدەپارێزێت‌و خۆی دەداتە پەنای وەك دەستەڵاتدارو فەرمانڕەو بەرپرسیار.

*بەهێزی لەش‌و لارو جوانی‌و قەڵەوی بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵ‌و باری، لاوازیشی گۆڕانی رەنگی لەگەڵ بۆنکردنی بەڵگەیە لەسەر خراپی حاڵی ئەوەی بەڵگەیە لەسەری.

*لەش‌ولاریش ئەگەر قەڵەوو بەرچاوبوو لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەی بەرزی خاوەنەکەی‌و سەرکەوتنی بەسەر دوژمنەکانیدا.

**لەشیربراو:** لەخەودا کورێکی بەرێزەو ئەگەر بینی لەشیربراوێکی لایە کورێکی پێدەبەخشرێ.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر دەستیدا لەئاژەڵێك لەشیربرابوەوە یان دەستیدا لەمنداڵێك لەشیربرابوەوە بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارەو ناخۆشی.

**لەگوناهو تاوان خۆشبوون:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بۆیەکێك شایستەی سزابێت بەڵگەیە لەسەر خێر یان لێخۆشبوون ،خوداوەند دەفەرموێ:

﴿قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ

لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ (الأنفال: ٣٨)
هـەروەها دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ لِلَّذِينَ آمَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ أَيَّامَ اللهِ لِيَجْزِيَ قَوْمَاً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (الجاثية: ١٤).

**لەگەن (قاپی مس):** (نابلسی)دەڵێت: وەك تەشت وایە، ئەگەربینی تەماشای لەگەنێكدەكات هەروەك چۆن تەماشای ئاوێنـە دەكـات بەڵگەیـە لەسـەر لەدایكبوونی منداڵ.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر كچ یان ژن یاخود خزمەتكار.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: بینینی لەخەودا خۆشەویـستی پیـاوە، خۆشەویـست ئەوەیـە شـتێكی خۆشـی پێشكەشدەكرێ.

(نابلـسی) دەڵێـت: لەخـەودا رزقـی مرۆڤـە، ئەگـەر بینـی لەگەنەكـەی هەڵدەواسـێ رزق و رۆزی تـەواوبوەو چارەنووسی ئامادەیە.

*ئەگـەر كۆمـەڵێ خـەڵكی نۆری گوندنـشینی بینـی لـەنێو لەگـەنێكی گـەورەدا زەوی و زار یـان شـوێنێكی خۆیانـە لەسـەری كۆدەبنـەوە، ئەگـەر جـەنگاوەربوون كۆبونەوەیانە بۆ ئـەو مەبەسـتە، ئەگـەر كارگـەبوون كۆدەبنەوە بۆ ئەنجامدانی كارەكەیان.

*ئەگەر بینـی میزدەكاتـە لەگەنێكەوە یـان كوپەیـەك دەچـێتە لای خانەوادەكەی.

**لـەماڵ نەهاتنـە دەرەوە:** بەڵگەیـە لەسەر ژنێكی داوێنپاكی پارێزراو.

**لەوەڕ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: لـەوەڕی گونجاو دنیاو جوانكارییەكانیەتی.

*بینینی حەشیش بژێوی ئاژەڵـەو وەك ماڵوسـامانی دنیایـە كـەمرۆڤ بـەپێی بەشی خۆی دەستگیردەبێت، هەروەها رزق و رۆزی مەردومـە چـونكە ئـەو لـەوەڕە دەبێـت بەگۆشـت و شـیرو بابەتـەكانی و دەبێـت بەهـەنگوین و دانەوێڵەو خوری وەك ماڵ و سامان وایە كەژینی بەندەكانی پێ وابەستەبووە.

*دەگونجێت لـەوەڕ بەڵگەبێت لەسـەر هەموو شوێنێك.

*هەروەها دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بـازاڕی پارەگۆڕینـەوەو زەڕەنگـەرو شوێنی زێڕ.

*دەگێڕنـەوە پێغەمبـەر(ﷺ)لـەوەڕی بـەدنیاو خۆشـگوزەرانی لێكداوەتـەوە، هـەروەها(ﷺ)فەرموویـەتی: "دنیـا سەوزوخۆشـە"و ئـەوەی بـەدەمی حوشترەوەیە بەڵگەیە لەسەر حەڵاڵ و

ترشــەكەی بەڵگەیەلەســەر حــەرامو، ئەوەی بەغـەمو پــەژارە بەدەستدێت ، ئەو لـەوەڕو كشتوكاڵەشی چارەسەری پێدەكرێ بەدەرە لەماڵو سامانو رزقو رۆزی بەڵگەیەلەســـەر زانیـــاریو ئامۆژگاریو دانایی.

*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر ماڵوسـامانێكی رەهـاو تـەواو، ئەگـەر تامی ترشبوو ئەو ترشیەی دەگەڕێتەوە بـــۆ ئـــەو غـــەمو پەژارەیـــەی كەبەدەســتیدەهێنێت بەمانــدوبوونو هیلاكی، ئـەوەی ژاری بكوژە بەڵگەیـە لەسەر خەشمو قینگرتن لەحەرامـەوەو بەدەستهێنانی دنیا بەسوودو بیدعـەو ئارەزوو.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا رزقو رۆزییـە بەئاسـانی بەدەسـتدێت لـەژنێكی كـەم داراییو ماڵوسمان، یاخود زانیارییەكی خوداوەندییــە یـــاخود خێرێكـــی بەردەوامــەو دەگونجێــت بەڵگــەبێت لەسەر ئیسلام.

*ئەگـەر خـۆی لـەپاوانو لەوەڕێكـدا دییـەوە یاخود خـەریكی كۆكردنـەوەی حەشیـشبوو یـان دەیخـوارد تەماشـای حاڵیـــدەكرێ ئەگـــەر هـــەژاربوو دەوڵەمەنـددەبێ ئەگـەر دەوڵەمەنـدبوو پـــتر دەوڵەمەنـــددەبێت، ئەگـــەر دنیانەویستبوو دنیای بۆ دەگەڕێتـەوەو تووشی فیتنەو ئاشووب دەبێت.

*ئەگەر لەپاوانو لەوەڕێكەوە چوو بۆ یــەكێكیتر لــەپێناوی دنیــادا ســەفەر دەكـــاتو بەزاڕێكـــەوە دەچـــێت بـــۆ بـــازاڕێكیترو لەپیـــشەیەكەوە بـــۆ یەكێكیتر.

**لەیـەك زویربـوون:** (نابلـسی)دەڵێـت: لەیـەك زویربـوون لەخـەودا پێچەوانەی تەباییە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسـەر دۆڕاندنو پشتهەڵكردن لەكاتی یەكـەمی رووبەرووبوونەوەدا.

## ل ی

**لیمـۆ:** (نابلـسی)دەڵێـت: دەگونجێـت سەرزەنشتو لۆمەبێت.

*لیمۆ بەڵگەیە لەسەر نەخۆشـی ئەگـەر زەردبـــوو لێیـــدەخوارد، ئەگـــەر لێـــی نـەخوارد مـاڵو سـامانە، لیمـۆی سـەوز باشـــترە لـــەزەرد هـــەموو میـــوەو جلوبەرگێكی زەردیش هەروایە.

*لیمـۆ سەرزەنـشتكارە، هەركەسـێك لیمۆیەكبدات بەیەكێك لۆمـەی دەكـاتو داری لیمۆ پیـاوێكی فـرە بەسـوودە بـۆ خەڵكی، هەروەها گوتراوە ژنێكە خێری زۆرەو راوبۆچوونی خراپو لاری هەیە.

**لینۆفەر**[1]: (ئیبن سیرین)دەڵێت: ماڵو سامانێکی حەڵاڵە لەلایەکەوە کۆدەکرێتەوەو لەلایەکیترەوە خەرجدەکرێ.
(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر شاردنەوە یان ژیان یاخود سەفەر بەدەریادا.
* ئەگەر کەسێك بەدەریادا سەفەریدەکردو (لینۆفەر)ی بینی ترسی نوقمبوون یان وەستانی رەشەبای لێدەکرێ.
* هەروەها بەڵگەیە لەسەر:
+غەموپەژارەو نەخۆشی.
+پیاوێکی دارا لەکاروبارەکانیدا.
* ئەگەر بینی لینۆفەری بەدەستهێنا بەڵگەیە لەسەر فرە رارایی‌و نەخۆشی یان زۆر پەژارەو دڵتەنگی.

## ل ێ

**لێپرسەر**: (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر چاکبوونی گشتی.
* ئەگەر مرۆڤێکی لێپرسەری لەحاڵێکی باشدابینی‌و بۆنێکی خۆشی هەبوو بەڵگەیە لەسەر باشی ناویانگو ژیاننامەی، ئەگەر لەحاڵێکی خراپدا بەدیکرد یاخود بۆنێکی ناخۆشی لێدەهات یان چاوەکانی کوێربوون بەڵگەیە لەسەر خراپی‌و رێکخستن لەوەی دەستیداوەتێ.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کوڕێکی پەروەردەکارو مامۆستاو دادوەر، ئەگەر لێپرسەربوو بەڵاونەهامەتی رووی تێدەکاتو خوداوەند پاداشتی دەداتەوەو دەبێت بەپشتیوانو ئەجرو پاداشتدەدرێ.

**لێپرسینەوە**: (نابلسی)دەڵێت: بۆ مردوو بەڵگەیە لەسەر سزاو لێپرسینەوەی، ئەگەر مرۆڤ لەخەودا لێی پرسرایەوە لەسەر خەرجی یان بەروبووم بەشێوەیەکی سووكو ئاسانو لەبێداری‌و بەئاگایشدا لەسەر سەفەربوو بەڵگەیە لەسەر سوود وەرگرتنی لەو سەفەرو گەڕانەوە بەبێ زیان بۆ زێدو نیشتمانی خۆی.
* ئەگەر مرۆڤ بەتووندی لێی پرسرایەوە بەڵگەیە لەسەر تەوبەو گەڕانەوەی بۆلای پەروەدگار.
* ئەگەربینی لەخەودا نزیکە لەلێپرسینەوە بەسووکی لێیدەپرسنەوە، یان خاوەنی هاوسەرێکی ئاینداری بەسۆزو بەزەییە.

---
[1] **لینۆفەر**: جۆرە رووەکێکە لەئاوی مۆڵو وەستاودا دەڕوێت. "فەرهەنگی دەریا:٢/١١٥٢"

**لێخۆشبوون:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی ببینێ داوای لێخۆشبووندەکات لەخوداوەند رزقیکی حەلاڵو منالْی نێرینەی پێدەبەخشرێ بەپێی ئایەتی: ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا﴾(نوح:١٠).

*ئەگەر بینی لەنوێژ بوەوەو داوای لێخۆشبوونیکرد لەپەروەردگارو روویکردوەتە قیبلە دوعاکەی قبوڵدەبێت.

*ئەگەر رووی لەقیبلە نەبوو گوناهێك ئەنجامدەداتو پاشان دەمرێت، ئەگەر بێدەنگبوو لەداوای لێخۆشبوون بەڵگەیە لەسەر بەخشین بەپێی ئایەتی : ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللهِ﴾(المنافقون: ٥).

*ئەگەر ژنێك بینی پێی دەڵێن: داوای لێخۆشبوون بکە گرنگیدەدات بەگوناهو داوێن پیسی بەپێی چیرۆکەکەی (زلێخا).

(نابلسی) دەڵێت: داوای لێخۆشبوونی مرۆڤ لەخەودا بەڵگەونیشانەیە لەسەر فراوانی رزقو رۆزی، ئەوەشی بەدەر لەنوێژدا داوای لێخۆشبوون بکات بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی.

*دەگونجێت داوای لێخۆشبوون بەڵگەونیشانەی سەرکەوتنو دوورخستنەوەی بەڵاو نەهامەتیبێت .

*ئەوەی ببینێ داوای لێخۆشبوون دەکات پەروەردگار لێی خۆشدەبێتو مالْو منالْو خزمەتکارو بەهەشتو رووباری پێدەبەخشێت.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر گوناهی کەسێکی بینی کارێك ئەنجامدەدات خوداوەند لێی خۆشدەبێ بەپێی ئایەتی: ﴿ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللهُ لَكُمْ ﴾ (النور:٢٢)، ئەگەر بینی کەسانیتر لێی خۆشبوون تەمەندرێژ دەبێو پلەوپایەی بەرز بەدەستدەهێنێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەوەی لێی خۆشدەبێ تەمەندرێژدەبێتو ناوداریو پاکێتیو پیاهەڵدانو بەدەستدەهێنێ.

*لێبوردەیی لێخۆشبوونە، ئەگەر بینی لەمرۆڤێك خۆشبوو حەقیك دەچێتە ئەستۆی یاخود حەق لێکردنەوەو تۆڵەیەكو خوداوەند لێی خۆشدەبێ.

*لێخۆشبوون لەکاتی بوونی دەستەڵاتدا بەڵگەیە لەسەر خواناسیو ترسان لەخوداوەند.

*ئەگەر یەکێك بینی خودا لەخەودا لێیخۆشبوو یاخود پێغەمبەر (ﷺ)

چاوپۆشی لێکرد بەڵگەیە لەسەر تەوبەو ڕێنومایی‌و چارەنووسی باشی.

**لێدان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خێرێکە لێدراو بەدەستیدەهێنێت لەلێدەرەوە مەگەر لێدانەکە بەداربێت ئەوکاتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەڵێنی پێدەدات بەڵێنەکەی بەجێ ناگەیەنێت.

* ئەگەر بینی دەستەڵاتدار یا پادشایەك لێیدەدات بەدار پۆشتەیدەکات، ئەگەر لەپشتیدا قەرزەکەی دەداتەوە، ئەگەر لەپاشیدا هاوسەری بۆدەهێنێ، ئەگەر بەدار لێیدا خراپەیەك ڕووی تێدەکات.

* هەروەها دەڵێن: لێدان بەڵگەیە لەسەر گۆڕان ، هەروەها دەڵێن: لێدان ئامۆژگارییە.

* ئەگەر بینی بەقامچی دەکێشێ بەسەری پیاوێکداو کاریگەری هەبوو لەسەری دەیەوێت بەرپرس‌و گەورەکەی بڕوات، ئەگەر لەپێڵوی چاویدا دەیەوێت ئاینەکەی بشکێنێ، ئەگەر مووی پێڵوی هەڵکێشا بانگیدەکات بۆ بیدعە، ئەگەر لەئێسکەکانیدا لەگۆڕانکاریدا دەکاتە کۆتاییەکەی‌و لێدەر دەگات بەویست‌و خوازی ئەگەر لەنەرمایی گوێچکەیداو دایدڕی‌و خوێنی لێهات دەچێتە لای کچی لێدراو.

* هەروەها دەڵێن: هەر ئەندامێك لەئەندامەکانی بەڵگەیە لەسەر ئەو نزیکەی لێکدانەوەی ئەو ئەندامەیە.

* هەندێك لەڕاڤەکاران دەڵێن: لێدان دوعایە ئەگەر بینی لەپیاوێك دەدەن دوعای لێدەکات، ئەگەر لێیداو ئەویش لەپشتەوە باڵی بەسترابوو قسەیەکی خراپی لەگەڵدادەکات‌و بەناقۆڵاو خراپ باسیدەکات.

(نابلسی) دەڵێت: لێدان بەقامچی لەخەودا وتەی خراپ‌و ناقۆلایە، ئەگەر خوێنی لەبەرڕۆیی لەماڵ‌و داراییدا زەرەدەکات.

* لێدان بەقامچی درێژ ژیان‌و حاڵی مردوە لەگەڵ دەرخستنی کارێکی ئاڵۆز.

* لێدان بەشمشێر بەڵگەی سەرکەوتنە بەسەر دوژمناناداو پووچەڵکردنەوەی بەڵگەکانیانە، ئەگەر شمشێرەکەی بچڕا بەڵگەکەی جێگیردەبێت، ئەگەر نەشکا بەڵگەی دوژمنەکەی دەردەکەوێ.

* ئەگەر بینی لەگوێدرێژێکیدا خۆی سواری بوبوو پیاوێکە ناننا خوات هەتا دوعانەکات‌و داوا لەپەروەردگار نەکات.

*ئەگەر بینی لەهەندێك لەوانەی لەژێر دەستیدان دەدات بەڵگەیە لەسەرئەوەی ژنەکەی زینادەکات، لێدانی بەدەر لەژن لەوانەی لەژێر دەستیدان هۆکاری سوودمەندکردنی لێدەرن بۆی.
*ئەگەر بینی لەکەسانێکدەدات لەژێر دەستیدانین هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سوودمەندکردنی لێدەر بۆیان.
*ئەگەر بینی لەیەکێك دەدات لەژێر دەستیدا نییە بەڵگەیەکی خراپەو نیشانەی زەرەرە رووی تێدەکات.
*ئەگەر بینی خۆی لێیدەدات باشە ئەگەر هەندێك لەفریشتەکان یاخود مردوان یا ئەوانەی لەژێر دەستیدان لێی بدەن بەڵکو ئەوەی لێیان دەدات کەسانیتر بێت، باشترینی ئەوەیە مرۆڤ ببینێ بەگۆچان یا بەدەست لێیبدات.
*لێدان بەقامیش باش نییە.
*ئەگەر بینی لەکەسانیتر دەدات سوودمەنترە بۆی لەوەی کەسیکیتر لێیبدات.
*هەروەها دەڵێن: لێدان بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەلێدەر ئەدەب فێری لێدراو دەکات، ئەگەر خوێنی نەبینی لەبەری بڕوات شادیو دڵنیایی دەهێنێت بۆ لێدراو.
*لێدان لەخەودا سەفەرە، ئەگەر بینی لەزەویدەدات سەفەردەکات.
*ئەگەر سەد جەلدەیان لێدا لەخەودا زینایکردوە یاخود ویستوویەتی زینا بکات.
*ئەگەر چاڵێکیان بۆ هەڵکەند هەتا بەردەباران بکریو خۆشی هاوسەرداریوو زینایکردوە یان ئالوودەی کارێکی ئاوابوە.
*ئەگەر چل جەلدەی لێدرا هی مەیخواردنەوەیە، ئەگەر هەشتا جەلدی لێدرا ژنانی داوێنپاکی هاوسەرداری تۆمەتبارکردوە.
*ئەگەر مردوویەکی بینی لێیدا یا خەریکبوو لێیدەدا گوناهێکی کردوە یاخود سوربوە لەسەری چونکە مردوو لەقیامەتدایەو بەتەنیا رازییە بەوەی خوداوەند پێی رازییەو بێئاگایە لەناحەق.
*لێدانی زیندو بۆ مردو هێزی حاڵی زیندوە لەئاینو نوێژو (حەج)و زەکاتدا ئەمەش ئەگەر مردوو رازیبوو بەلێدانو ملکەچبوو بۆی.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی مردوویەك لێیدا خێری لەسەفەر

دەستگیردەبێت، ئەگەر شتێکی لەکیسچووبێت بەدەستیدەهێنێتەوە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر مردوویەك لێیدا قەرزەکەی دەداتەوەو لێدانی زەویش سەفەرە.

*لێدانی مرۆڤ بەبێ برینداركردنی یاڕووشاندنی ئێش‌و ئازارە یاخود داپۆشینە ئەگەر لەوەرزی زستانابێت، وەگەرنا گوتەی مردوە.

*لێدان بۆ ئەو ئا[illegible]ەی شایستەیە تەمێکردنەو بۆ ئاژەڵێکیش شایستە نەبێ نەزانین‌و دەستدرێژیکردنە.

**لێدانی دڵ:** لێدانی دڵ وازهێنانە لەبەریەرەکانی‌و پێکداداان یاخود سەفەرو هاوسەرگیرییە.

**لێدانی گاڵتە(سوعبەت):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی بەگاڵتەوە لەدەرگای پێشەوا دەدات بەبزمارو سەمادەکات دەسەڵات‌و پۆستی فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێ ئەگەر شایستەبێ، وەگەرنا گفتوگۆو قسەگەرمدەکات.

**لێدانی گەردن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر لەگەردنی دراو سەری لێجیابووەوە ئەگەر نەخۆشبوو چاکدەبێتەوە، ئەگەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوە، ئەگەر وازی لەژنهێنان هێنابوو (حەج)دەکات، ئەگەر لەترس‌وبیم‌و ناڕەحەتیدابوو دەرووی لێدەکرێتەوە.

*ئەگەر ئەوکەسەی ناسی کەلەگەردنیدا لەسەر دەستی ئەوکەسەدا دەبێت، ئەگەر ئەوەی لێیدا منداڵێکی نابالغبوو پشوودەرە بۆی لەناڕەحەتی‌و نەخۆشی‌و ئەوەی رووی تێدەکات لەجیابوونەوەو دەرچوون لەدنیا.

*هەروەها ئەگەر وایبینی‌و نەخۆشبوو نەخۆشیەکەی درێژەی خایاند گوناهو تاوانی هەڵدەوەرێ یاخود ئەگەر بەچاکەکارو ناسرابوو بەباشترین شێوە دەچێت بۆ دیداری پەروەردگار، ئەو بەڵاو نەهامەتیەشی لەکۆڵدەبێتەوە.

*ئەگەر لەگەردنی کەسێك درا نەخۆش نەبوو بەلاداریشنەبوو نازو نیعمەتەکەی دەبڕێت‌و لەدەستەلات دەخرێ‌و سەرجەم کاروبارەکانی دەگۆڕێت.

*ئەگەر بینی پادشایەك یاخود دەستەلاتدارێك لەگەردنیدەدات لێکدانەوەی دەستەلاتدار پەروەردگارە لەغەم‌و پەژارە قوتاریدەکات‌و یارمەتیدەریدەبێت لەکاروبارەکانیدا.

*ئەگەر بینی فەرمانڕەوایەك دەدات لەگەردنی بەردەستەکانی خۆشدەبێ لەتاوانباران‌و ئازادیاندەکات.

* لێدانی گەردن لەلایەن فەرمانڕەواو ئازادکردن یان گواستنەوەیەو بۆ پارەگۆڕەرەوەو داراییەو بەڵگەیە لەسەر ڕۆینی سەرمایەو بۆ سەفەرکارانیش بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەیان.
* ئەگەر بینی دەستەلاتدارێك لەخەڵکی ژێردەستەی خۆیدا دادپەوەر دەبێت لەگەڵیان.
* ئەگەر بینی گەردنیکرد بەدوو کەرتەوەو هەر لایەکیبرد بۆ لایەك دوو ژندەهێنێت ناتوانێ بەدادپەوەری بەڕێوەیانبەرێت و پێشی خۆش نییە دەستیان لێهەڵبگرێ، هەروەها دەڵێن: ئەگەر شتێکی ئاوای بینی لەماڵ و داراییەکەی جیادەبێتەوە.
(نابلسی) دەڵێت: دەگونجێت لەخەودا واز لەنوێژبهێنێ یاخود پاشگەزببێتەوە لەئاین.
* ئەگەر بینی لەگەردنی دەدرێت بەفەرمانێك لەلایەن دادوەرەوە یاخود لەرێگە بریندداریانکرد لەجەنگدا باوکی دەمرێ ئەگەر باوکی هەبێت یان منداڵداریێ.

**لێژایی (زەوی نەرم و نشیو):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی پێدا دەڕوات نارەحەتی یان غەم و پەژارەیەك رووی تێدەکات چاوەڕێیە کۆتاییەکەی باشبێ.

**لێسانەوە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: لێسانەوەی ماست و ئاووشتیتر بەڵگەیە لەسەر رژدی یان کاروکاسبی ئاسان.
* دەگونجێت لێسانەوەی باش بەڵگەبێت لەسەر گەورەی بەنرخ یان ئەوەی مرۆڤ دەیلێسێتەوە.
* ئەگەر بەتوندی لێیان پرسیەوە زیاندەکات.

**لێفە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ژنەو لەگەڵ پیاودایە، ئەگەر بینی لێفەیەکی لەشەودا هێناو تیایدا نوست ژنێك دەهێنێ و هێمنی و ئارامی لێدەستگیردەبێ.
* لێفە پشووە.
* هەروەها گوتراوە: ژنێکی بەسوودەو بەڵگەیە لەسەر هێمنی و ئارامی.
(ئیبن سیرین)دەڵێت : لێفە ژن و بژێوی پەیداکاری ماڵە.
* ئەگەربینی لێفەیەکی پۆشیوە دەچێتە لای ژنێکی شۆخ و شەنگ.
* ئەگەر لێفەیەکی سووری پۆشی تووشی کوشتاردەبێت بەهۆی ژنێکەوە.
(نابلسی)دەڵێت: لێفە لەخەودا ژنی خەوبینەر یان کەیبانووی ماڵەکەیەتی.
* ئەگەربینی لەنێو لێفەیەکدا نووست ژنێکی دیندار دەهێنێ.
* ئەگەر لێفەیەکی سووری پۆشی تووشی کوشتارو شەڕدەبێت بەهۆی

ژنەکەیەوە، بەهەمان چەشن جێگەو شەروالّو نەعلیش هەروایە.

*ئەگەربینی شتێکی لێداماڵرا یاخود سووتا یان بردیان لەژنەکەی جیادەبێتەوە بەتەلاّقدان یاخود مردن.

**لێکدانەوە:** (نابلسی) دەڵێت: لێکدانەوە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بیستنی هەواڵ لەسەرزاری کەسی درۆزن، ئەگەر یەکێك بۆی لێکدایەوە لەخەودا راستگۆبوو بەوچەشنە دەبێت کەوتویەتی.

**لێکۆڵەر( توێژەر):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لێکۆڵەرو پشکنەر لەخەودا جەنگاندنە لەگەڵ نەتەوەیەکی دووڕوو زەوتکردنی ماڵو داراییانە بەفروفێڵ.

**لێکۆڵینەوە لەدەنگوباس:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بریتییە لەسیخوڕیو گوێگرتن لەرووداوێك کەناگونجێت گوێی بۆ رادێرێ.

**لێنراو بەگۆشتەوە:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا دەوڵەمەندییە بۆ هەژار، بەلاّم لێنراو بەبێگۆشت هەژاری یا بەندایەتییە.

*ئەگەر خۆی خواردنێکی خۆشی لێنا پلەوپایەیەك بەئەندازی خۆی وەردەگرێ یان دەوڵەمەند دەبێ دوای هەژاری.

*ئەگەر کەسێکیتر چێشتی بۆ لێنا دەگونجێت پلانبگێڕێ لەدژیو ترسی فریودانی هەبێت، دەگونجێت پشتگیری بەدەستبهێنێ لەسەر خواستو داواکەی.

*شیرەوا بەگۆشتەوە یان بە برنجەوە خۆشیو شادییە یان زانیاریو رزقو رۆزی بێشومارە.

*ئەوەی لەشیر دروستدەکرێ لەسەوزەو پاقلەو هاوچەشنەکانی تێکەڵبوونی وەچەو بیدعەیەکی باشە.

**لێو( لەوس):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لێو هاوڕێی پیاوە خۆی پێجواندەکاتو وەك پەناو پشتگیری وایە، لێوی ژێرەوە لەلێکدانەوەدا بەهێزترە لەلێوی سەرەوە.

*هەروەها دەڵێن: لێو لەلێکدانەوەدا خزمایەتییە، لێوی سەرەوە ئەوەی کەوا لەهەموو کاروبارەکاندا پشتی پێدەبەسترێ لەلێکدانەوەشدا بەو شێوەیە ئەگەر ئێشو ئازاری پێوەببینێ کاروباری هاوڕێکانی بەباشی ناڕوات بەڕێوە.

*ئەگەر بینی هەردوو لێوی بڕاوە ئامازەو چاوداگرتنە.

*ئەگەر لێوی سەرەوەی بەبڕاوی بینی ئەوکەسەی پشتگیریدەکات لەکاروبارەکانیدا پشتیتێدەکات.

*هەروەها دەڵێن: لێکدانەوەی هەردوولێو لەدەوری ژن دەگیرسێتەوە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لێوی خوارەوەی ئەما ژنەکەی دەمرێت یان تەلاقیدەدات.
*ئەگەر لێوی سەرەوەی درزو شەقیبردبوو ئەو تاکەی دەدرێتە پاڵ لێو دەبێت بەدوان، ئەگەر لێوی خوارەوە درزیبرد گوزارشت لەدووژن دەکات، ئەگەر سەرەوەبوو دووهاوڕێیە، ئەگەر زوخمو کێمیکرد هەردوو هاوڕێکەی کۆکدەبن لەسەرراو کاروبارەکانی، ئەگەر پچڕا لەهاوڕێکەی جیادەبێتەوەو دەنگی لەگەڵ دادەبڕێ.
*لێو هێزو توانای پیاوو جوانییەتی، هەروەها لێو خزمایەتیەو بەڵگەیە لەسەر:
+نەخۆشیو بەلا.
+ئیرەیی.
+ئەو هەواڵو دەنگوباسانەی زامەکانی دەروون سارێژدەکەنەوە.
*دەگونجێت هەردوو لێو بەڵگەبن لەسەر:
+پەردەوانو منداڵو پاسەوانو دەرگای داخراو.
+زانیاریو ڕێنوماییو خواردنو خواردنەوە.
+خۆشیو ناخۆشی.
+شاردنەوەو پەنهانکردنی نهێنی.
*ئەگەر لەخەودا هەر لێوی نەبوو بەڵگەیە لەسەر لەدەستدانی منداڵ یان پاسەوان یاخود رمانی دەرگاکەی یا دانەخرانی یاخود ونکردنی کلیلەکانی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مردنی باوکو دایك یاخود یەکێك لەدووهاوسەر.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بژێوی ئەوانەی شمشاڵدەژەنن‌و هاوچەشنەکانیان یاخود وەك دروستکەری شیرینی کەفوودەکات بەکورەی ئاگردا نەك فرۆشەری یان دروستکەری شووشەو هاوچەشنەکانی.
*ناسکی لێوو سووربوونی بەڵگەیە لەسەر رەوانبێژیو ڕێنوماییو خواردنی باشو خواردنەوەو ئاهەنگو شایی.
*ناقۆڵایی لێویش یان قورسییان یاخود رەشداگیرسانیان یان شینبوونەوەیان بۆ نەخۆش بەڵگەیە لەسەر مردنی چونکە لەنیشانەکانی مردنە.
*دەگونجێت پێکەوەدانی لێو بەڵگەبێت لەسەر پێڵوی چاو.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر عەورەت.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەملاولای روبارو بیر یان ئەوەی دەخرێتەسەر بیرو هاوچەشنەکانی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پاشی مرۆڤ.



# میم

**م ا**

**ماچ**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: ماچ بەئارەزوەوە بەدەستهێنانی داوایەو ماچکردنی منداڵیش خۆشەویستییە لەنێوان باوکی منداڵو ئەوەی ماچیدەکات.

*ماچکردنی خزمەتکار خۆشەویستی نێوان گەورەو خزمەتکارە.

*ئەگەر بینی ماچی دەستەڵاتدارێکیکرد لەشوێنی ئەو دادەنرێ، ئەگەر دادوەرێکی ماچکرد وتەکانی پەسەنددەکرێ.

*ئەگەر دەستەڵاتدار یان دادوەر ماچیانکرد لەلایەن ئەوانەوە خێری دەستگیردەبێ.

*ئەگەر بینی پیاوێك نێوان هەردووچاوی ماچکرد هاوسەر دەگرێ.

*ئەگەر بینی پیاوێك ماچیدەكات یا جووتدەبێ لەگەڵی بەئارەزوەوە خوازو داوای بەدەستدەهێنێ، ئەگەر ماچەکەی بۆ ئارەزووبوو بکەر لەکارلێکراو خێری دەستگیردەبێ یان زانیاریو رێنماییو گەیشتن بەچاکە.

*ئەگەر ماچەکەی بەبێ ئارەزووبوو کارپێکراو لەبکەرەوە خێروچاکەی دەستگیردەبێ.

*ئەگەر خزمەتکارێکی کچی ماچکرد راستیکردوە لەگەڵ بەرپرسەکەی، ئەگەر ماچی ژنێکیکرد راستگۆدەبێ لەگەڵ مێردەکەی.

*ئەگەر بینی کورەکەی ماچیدەكات ئەگەر باڵغبوو سوودی لێوەردەگرێ یان لەباوکی، ئەگەر بەئارەزوەوە کورەکەی ماچکرد ماڵو سامانێکی کۆکردوەتەوە دەیەوێت بیدات پێی ، ئەگەر ماچکە بەبێ ئارەزووبوو لەکوڕ یا کچی خۆشحاڵی دەستگیردەبێت.

*ئەگەر مرۆڤێك چاوی ماچکرد ژنو پیاو لەگەڵ یەك کۆدەبنەوە .

*ماچکردنی دەمی یار دینارەو لەگۆناو کوڵمدا درهەمە.

*ماچـــکردنی ژن ڕووتێکردنـــە یـــان موسوڵمانبوونی کەسێکی خۆشەویستە.
*ماچـــکردنی پـــیر پۆزشـــهێنانەوەیە لەقسەیەك.
*ماچکردنی کچ پەرداخێك بادەیە.
*ئەگەر زانایەك ژنێکی شۆخو شەنگی ماچـکردو قورئـان ماچدەکات ، ئەگـەر حەزی لەدنیابوو دنیایە.
*ئەگـــەر قورئـــانی ماچـــکرد (حــــج)دەکـــاتو بەردەڕەشــــەکە ماچدەکات.
*ئەگەر بینی ژنێك ماچدەکات خـۆی ڕازاندوەتـــەوە یـــا جووتبـــوو لەگـــەڵی بێوەژنێك دەهێنـێ مێردەکـەی مـردوەو ســـوود لـــەماڵو ســـامانو منداڵـــەکانی دەکـــاتو لەوســـاڵەدا خێـــر ڕووی تێدەکات.
*ئەگـــەر بینـــی مردوویـــەکی ناســـراو ماچـــدەکات ســـوود لەزانیارییـــەکی مردووەکـــە دەکـــات کەلـــەدوای خـــۆی بـــەجێی هێشتوە یـان لـەماڵو سـامان یاخود لەکردارەکانی کەلە حـاڵی ژیانـدا ئەنجامیداوە.
*ئەگـــەر بینـــی مردوویـــەکی نادیـــار ماچـــدەکات لەمردوەکـــە یـــان لەجێنـــشینەکانی ســـوودو قـــازانج وەردەگرێ.
*ئەگـــەر بینـــی مردوویـــەکی نادیـــار ماچـدەکات مـاڵو دارایـی لەلایەکـەوە دەســـتگیردەبێ چـاوەڕێی نـەکردوە، ئەگەر مردوویەك ماچیکرد لـەو مـردوە یـــان لەجێنـــشینەکانی ســـوودو قازانجدەکات.
*ئەگـــەر مردوویـــەکی ناســـراو یـــا نەناســـراوی ماچـــکردو ماچـــەکە بـەئارەزووی مارەبڕینـەوەبوو داواکـەی دەستگیردەبێ.
*ئەگـەر نەخۆشـێك بینـی مردوویـەك ماچـدەکات بەڵگەیـە لەسـەر مردنـی، ئەگـــەر لـــەشولار ســـاغبوو بەڵگەیـــە لەســـەرئەوەی وتـــەکانی لەوکاتـــەدا ناشیاون چونکە مردوویەکی بـێ ڕوحـی ماچکردوە.
مار: (ئیبن سیرین)دەڵێت : دەگونجێت بێبـاوەڕ یـاخود خـاوەن بیدعـەبێت بەهۆی ئەو ژارەوە هەڵیگرتوە.
*دەگونجێت (حیاة) لەناوی (مـار)ەوە وەرگیرابێت وەك بینینی لەکێڵگەدا یـان بدرێتە پـاڵ دارو گرژکردنیـان چـواندوە بـەئاو، دەگونجێـت مـار فـەرمانڕەواو دەستەلاتداربێت، یان هاوسەرو کوڕبێت بـەپێی ئایـەتی: ﴿إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ

وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾ (التغابن : ١٤).

*ئەگەر لەگەڵ مارێکدا بەجەنگهات یان بەربەرەکانی لەگەڵکرد لەگەڵ دوژمندا بەجەنگدێت، ئەگەر مارەکەی کوشت زەفەر بەدوژمنەکەی دەهێنێت، ئەگەر پێوەیدا زیانو خراپەی لەدوژمنەکەیەوە پێدەگات بەئەندازەی ئەو پێوەدانە، ئەگەر گۆشتەکەی خوارد زەفەر بەدوژمنەکەی دەهێنێتو خۆشیو شادی پێدەگات، ئەگەر مارەکەیکرد بەدووکەرتەوە گەواهیو گوتەی دادپەروەری لەدوژمنی دەبیستێ.

*ئەگەر مار بۆی بدوێتو قسەو گوتەیەکی نەرمو نیانی لەگەڵدا بکات خێرێکی پێدەگات خەڵکی پێی سەرسام دەبن.

*ئەگەر مارێکی تۆپیوی بینی دوژمنەو خوداوەند شەڕو خراپەی لێدووردەخاتەوە بەبێهێزو هەوڵدان.

*<u>ماری سپی</u>: سەرسەخترین دوژمنە، **<u>ماری رەشیش</u>**: خراپترە.

*ئەگەر بینی بوە بەخاوەنی رەشماری گەورەو ئەژدیهاسەر دەبێت بەپێشەنگی کۆمەڵێکو موڵكو دەستەلاتێکی گەورەو بێشومار بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر مارێکی سافو لووسی بەدەستهێناو رامو گوێڕایەڵیبوو بەچەکو هیچ ئامرازێکیتر زیانی پێنەگەیاند گەنجو دەوڵەمەندی یەکێك لەفەرمانڕەوایان بۆ ئەو دەبێت، دەگونجێت باپیرەی بێت ئەگەر ئەو سیفەتەی تێدابێت.

*ئەگەر لەمارێك بترسێ بەڵام نەزانێت چ مارێکە دڵنیادەبێت لەدوژمنەکەی، ئەگەر دەستنیشانو دیاریکرد ئەوجا ترسا لێی ترسو بیمە، هەروەها هەموو ترسو بیمێك مەترسی هەبێت لێی بەڵام دیارینەکاتو هاتنەدەرەوەی مار لەمندالأن کوڕە، ئەگەر مارێك بباتە ماڵەوە دوژمنەکەی پلاندەگێڕێ لەدژی.

*ئەگەر بینی هەڵیدەگری ماڵو دارایی پێدەگات لەلایەن دوژمنەوە بەدڵنیایو بێ دڵەراوکە بەپێی ئایەتی: ﴿ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ ﴾ (طه: ٢١).

*توولەمار کوڕە ، ئەگەر ماری بینی لەبازاڕ دەکوژرێت لەکاتی جەنگدا زەفەر بەدوژمنەکەی دەبات.

*مار دەستەلاتدارو فەرمانڕەوایەکە دژایەتی لەناخیا هەڵدەگریو نهێن پۆشیدەکات.

*ئەگەر مارێکی بینی لەعەورەتیەوە هەتا دەرەوە پاشان بۆ جارێکیتر

خۆیکردەوە بەنێویدا کەسێکە ناپاکی لەگەڵدەکات.

*مار ژنە، ئەگەر بینی مارێک دەکوژرێت لەسەر جێگەکەی ژنەکەی دەمرێت.

*ئەگەر مارێك ئالأبوو لەگەردنیو کردی بەسێ پارچەوە هەرسێ تەلاقی ژنەکە دەدات.

*درێژیو کەڵبەی مار هێزو توندوتیژیو پلانی دوژمنە، ئەگەر ببینێت بەمارێك لەحاڵێکەوەدەچێت بۆ حاڵێکیترو دوژمنی موسوڵمانان دەگرێتە خۆی لەگەڵ ئارەزووبازان.

*ماری ئاوی ماڵو داراییە.

*ئەگەر لەگیرفانیدا چەن تووله مارێکی بینیو رەنگیان سپیبوو لێی نەدەترسان باپیرەیەتی.

*ئەگەر مارێکی بینی بەدوایا دەڕۆیشت دوژمنەکەی دەیەوێت زیانی پێبگەیەنێ.

*ئەگەر لەبەردەمیدا لەرزی یا خولیخوارد دوژمنەو تێکەڵە بەلأم ناتوانێ زیانی پێبگەیەنن.

*ئەگەر چەن مارێکی بینی هاتنە نێو ماڵەکەیو بەبێ زیان چوونە دەرەوە دوژمنەکانی لەخانەوادەو کەسی خۆیەتی، ئەگەر لەماڵی خۆیدا نەیبینن دوژمنەکانی بێگانەن.

*گۆشتی مارو چەورییەکەی ماڵێکی حەلأڵی دوژمنە، دژەژارە لەدوژمنەکەی.

*ئەگەر ماری بینی لەهەموو لایەکەوە دەجەنگیو پەلاماردەداتو مارێکی گەورەی لێکوشتن دەبێت بەخاوەنی ئەو شارو ولأتە، ئەگەر مارەکوژراوەکە وەك سەرجەم مارەکانیتر وابوو یەکێك لەسەربازانی پادشا دەکوژرێت.

*ئەگەر مارەکە سەرکەوت بەبەرزاییەکدا خۆشیو شادی رووی تێدەکات.

*ئەگەر مارەکە لەبەرزاییەکەوە هاتەخوارەوە سەرۆکی ئەو شوێنو جێگەیە دەمرێت.

*ئەگەر مارێکی بینی لەزەوی هاتە دەرەوە سزاو خەشمە لەو شوێنو جێگەیە.

*ئەگەر کێڵگەو باخەکەی پڕبوو لەمار باخو کێڵگەکەی نەشو نمادەکاتو ئەو رووەکەشی تیدایە زیاد دەکاتو دەژێتەوە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرین)و پێی دەڵێ: لەخەودا بینیم مارێك دەجووڵێتەوەو منیش دوای

كەوتم، خۆيكرد بەكونێكداو منيش بێڵێكم بەدەستەوەبوو خستمەسەر كونەكە، ئەويش پێی وت: ئێستا ژن دەستنيشان دەكەيت؟ وتی: بەلێ، وتی: دەبيت بەميراتگری ئەو ژنەو دەوڵەمەنددەبێت ، ئەوجا ژنەكەی هێناو پاشان ژنەكە مردوو حەوت هەزار درهەمی بۆ بەجێهێشت.

*يەكێكيتر بينی ماڵەكەی پڕبوە لەمار، خەوەكەی بۆ (ئيبن سيرين) گێڕايەوە، ئەويش پێی وت: لەخوا بترسەو دوژمنی موسوڵمانان مەگرەخۆ.

*ژنێك هات بۆ لای و وتی باوكی (بەكر) ژنێك لەخەودا دوو دەرچەی هەبوو دوومار لەهەردوو دەرچەكە هاتنە دەرەوە، دووپياو هەستان و لەسەری مارەكان شيريان دەرهێناو دۆشيان، (ئيبن سيرين) وتی: مار شيری لێنايەت بەڵكو ژاری لێدێت، ئەو ژنەش دووپياو لەسەركردەكانی (خەوارج) دەچن بۆلای و بانگيدەكەن بۆ رێبازی خۆيان، هەروەها داوای لێدەكەن جنێو بەهەر دوو شێخی مەزن(رەزای خوايان لێبێت) بدات.

*ماری نێو سك خزم و كەس وكارەو هاتنە دەرەوەی لەپياوێك بەلاو نەهامەتيەكە رووده‌كاتە خزم و كەسێكی نزيك.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر مرۆڤ لەماری گەورە نەترسا هێزو دەسەلاتەكەيەتی، ماريش دوژمنێكی ماڵ و دارايدارە، چونكە لێكدانەوەی ژار ماڵ و داراييە.

*ئەگەر بينی خۆی بردیە نێو ماڵی خۆی دوژمنەكەی پلاندەگێڕێ لەدژی.

*ئەگەر بينی ماردەگرێ بەدەستيەوە ماڵ و داراييەكی لەدوژمنەوە پێدەگات بەهێمنی و ئاسايش ، ئەگە كوشتی زەفەر بەدوژمنەكەی دەبات.

*ئەگەر خوێن بەدەستيدا رژا دوژمنەكەی دەمرێت و ماڵ و داراييەكەی بۆ دەمێنێتەوە، ئەگەر پێوەيدا كەم و كوڕی دوژمنەكەی بۆ دەگوێزرێتەوە، ئەگەر مارەكەی سووتاند فەرمانڕەوا دوژمنانی دەكوژێت و زەفەريان پێدەبات.

*ئەگەر فڕی سەفەردەكات.

*توولەمار لەلێكدانەوەدا دوژمنێكی بچووكە.

*ئەگەر توولە مارەكە كوژرا مردنی كوڕی بچووكە .

*رەشمار خراپترو بەزيانترە، ماری سپيش دوژمنی لاوازو بێهێزە.

*ئەگەر مارێك لەگەڵی دوا بەنەرمو نیانی خۆشیو شادی رووی تێدەكات یاخود خێرو چاكەیەك لەدوژمنەوە بەدەستدەهێنێتو خەڵكی پێی سەرسام دەبن، ئەگەر بەڕەقی دوا لەگەڵی دەستدرێژدەكات بۆ دوژمن مەگەر لەگەڵ ئەوەدا پێوەدانهەبێت، چونكە كردار لەوتە زۆر بەهێزترە، لەكاتێكدا لەدەستی ئەو دوژمنە قوتاردەبێت.

*ئەگەر مارێكی بینی لەكونێك هاتە دەرەوەو جارێكیتر خۆی پێداكردەوە شەیتان تووشی غەمو پەژارەیدەكات.

*ئەگەر مارەكەیكرد بەدووكەرتەوە دوژمنەكەی بەویژدانەوە دەدوێتو رەفتار دەكات بەرانبەری، ئەگەر هەردوو كەرتەكەیبرد سوود لەدوژمنێكی سەرداری خاوەن شوێنكەوتە دەبینێ، ئەگەر كردی بەسێكەرتەوە بەربەرەكانی لەگەڵ دوژمنەكەیدا دەكاتو زەفەری پێدەباتو سێ دوژمن بۆی ملكەچ دەبن: پیاوێكی سەركردەو دەوڵەمەندێكی خاوەن ماڵو منداڵ.

*ئەگەر گۆشتی مارەكەی بەنیوكوڵاو خوارد زەفەر بەدوژمنەكەیو ماڵو دارایی دەباتو سەركەوتوو دەبێتو شادی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بەكوڵاویخواردی زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەكەیداو ماڵو دارایەكی حەلاڵ بەدەستدەهێنێتو ماڵەكەش بەهۆی جەنگو تێكۆشانەوە بەدەستدێت.

*ئەگەر زارەكە كاری تێكردو بەڕادەیەك گۆشتو ئێسقانەكەی هەڵوەری كوشتارو جەنگدەكات لەگەڵ دوژمنەكەیداو كوڕەكانی پەرتەوازە دەبن لەوڵاتدا، ئەگەر مردو كوشتاری دوژمندەكاتو دەیكوژێت.

*ئەگەر مارێكی بینی بەڵام دیارینەكردو هەڵهات لێی دڵنیادەبێت لەدوژمنەكەیو زەفەری پێدەبات.

*هەموو ترساوێك لەشتێك ئەگەر نەیبینی دڵنیاییە لەوەی لێیدەترسیو ئاگاداری وەردەگرێت بەرانبەری، ئەگەر دەستنیشانیكردو لێی ترسا ترسو بیمی بۆ دروستدەبێت لەلایەن دوژمنەكەیەوە بەڵام ناتوانێت زیانی پێبگەیەنێت.

*ئەگەر مارێكی هێنا ماڵی حەرامی دوژمنەكەی وەردەگریو زەفەری پێدەبات.

*ئەگـەر مـارێكی مـردووی بینـی خوداوەنـد دوژمنەكـەی لـەناو دەبـات بەئاسانی.
*ئەگـەر مـارێكیكرد بەدووكەوتـەوە دوژمنایـەتی دوژمنەكەیـدەكات بەدووبەشـەوە، ئەگـەر فـەرمانڕەواو پادشایەك خەوێكی ئاوای بینی پادشاو فەرمانڕەوایـەكیتر دەشـكێنیٚ یـاخود بێخۆماندوكردن لەناویدەبات.
*ئەگەر لەگەڵ مارێكدا دوا دوژمنێكی (فیرعەون) ئاسا سەر دەردەهێنیٚ.
*ئەگـەر بینـی مارێـك قووتیـداوە دەسـتەلاٚتو فـەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر مارێكی بەسەری خۆیەوە بینی پلەوپایـەو كەسـێتی لای پادشـاو فەرمانڕەوایان، بەرزدەبێتەوە.
*ئەگـە بینـی بـەنێو مـاردا دەڕوات خەوەكـەی بەڵگـە لەسـەر بـارانێكی مەزنو دۆڵەكان پڕ لەلافاو دەبن.
*ئەگەر ماری شاخدار ببینیٚ وەزارەتـی فـەرمانڕەواو پادشـا بەدەسـتدەهێنێت، ئەگەر شایستەبێت، ئەگـەر بازرگـانبوو سـوودو قـازانج لەبازرگانیەكـەی دەستدەكەوێت.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر داوێنپیسیو سروشتیانو پێوەدانیـان، دەگونجێت ماریش فەرمانڕەوا بێت.
*ئەگەر كێڵگەكەی پڕ لـەماربوو نـەشو نمـا دەكـاتو رووەكـیش زیاددەكـاتو دەژێتەوە.
*مار بەڵگەیە لەسەر:
+لێشاوو لافاو.
+دەستەلاٚتو ژیان.
*ئەگـەر بینـی مـارێكی كوشـتوە هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێكدا دەبەستیٚ.
*ئەگـەر بینـی مـار لەماڵێكـەوە دێتـە دەرەوە لانەو ماڵی بینراو وێرانـدەبێتو دەڕوخی بەسەر دانیشتوانەكەیدا.
*ئەگەر چەند مارێكی بینی ئەوەی تێدا نیـشتەجێدەبێت بەدەردەكـەوێتو گەرنەخۆش بێت دەمرێت.
*ئەگـەر مارێـك ببینـیٚ دەچـێتە نێـو دەمـی سـەردەكەوێت بەسـەر دوژمنەكەیدا.
*ئەگـەر بینـی مارێـك لـەلووتی دێتـە دەرەوە یـا لەپـشتی یـان لەشـوێنی میزكردنـی كورێكیـدەبێت ، ئەگـەر لەگوێچكەی هاتـە دەرەوە یـا لـەورگو عـەورەتی یـا لەپاشـی گونـاهو تاوانێـك ئەنجامـدەداتو كەمتەرخەمیـدەكات لەئایندا.

*ئەگەر بینی هەرمارێك لێی جیادەبێتەوە لەمرۆڤ کەسێك جیادەبێتەوە کەلەگەڵ یەکدا هاوشێوەبوون.
*ئەگەر بینی لەجێی خۆی مار دەگرێتەوە بەدەستی بەڵاو نەهامەتی لەلایەن خزمو کەسەکانیەوە یا لەلایەن خانەوادەکەیەوە.
*ماری نێو ماڵ دراوسێیەو هی دەشتو دەریش دزو جەردەیە.
*مار شەڕو ئیرەیی‌و ناپاکی‌و فێڵبازی‌و دوژمنایەتی دەرخستنە.
(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر پیاوی شیوو دۆڵنشین، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دوژمنایەتی لەلایەن کەس‌وکارو هاوسەرو منداڵەوە یاخود دەگونجێت دراوسێیەکی ئیرەییبەری درندەبێت.
*ماری ئاویی پەناوپشتگیری ستەمکارە یان ئاگادارییە لەلایەن دادوەرەوە دەردەچێت.
*ئەگەرببینێ بوە بەخاوەنی مارێك دەستەلاتدارێکی مەزن بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەرببینی مارێك گاز لەعەورەتی دەگرێت یان قووتیدەدات ژنەکەی زیناو داوێنپیسیکردووە.

**مارگر:** (نابلسی)دەڵێت: یەکێك ماربگرێت‌و کۆیبکاتەوە، بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکی شەڕەنگێزو خراپەکارداو دژایەتیکردن لەگەڵ دوژمناندا، ئەگەر ماری بەدەستەوەبوو خەوبینەر نەخۆشبوو بەڵگەیەلەسەر تەمەندرێژی، ئەگەر هیچی پێنەبوو بەڵکوو بوو بەکرمی ئاوریشم بەڵگەیە لەسەر تەوبە ئەگەر سەرپێچیکار یان دەوڵەمەندبوو هەژار دەکەوێ‌و بەپێچەوانەوە یان دەگونجێت لەپیشەیەکی خراپەوە بچێت بۆ پیشەیەکی چاك‌و باش.
*دەگونجێت مارگر بەڵگەبێت لەسەر شوێنەوارهەڵگرو هەموو پیشەوەرێك وەك چەقۆفرۆش‌و شمشێرفرۆشی عەجەم.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی گەڕی.

**مارمێلکە (قۆڕی):** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەو زانایەی دەستیدەگرێت لەتاریکاییەوە روو بەرووناکی.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی ناقۆڵای گۆڕاوو گوندنشینەو پیاوکوژە بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی عەرەبی گوندنشینەو فیل لەخەڵکیدەکات لەماڵو سامانیانداو ئەوەی بەدییکات نەخۆشدەکەوێ.
(دمیری)دەڵێت: ئەوەی مارمێلکە ببینێ لەخەودا نەخۆشدەکەوێ.

**ماره‌بڕ( مەلا - مامۆستای ئاینی ):**

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بۆ کەسێکی رەبەن بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری‌و بۆ هاوسەردداریش تەڵاقدان یان دەویتییە بەپێی بینینی خەوبینەرو ئەو مارەبڕینەی بینیویەتی.

**مارەبڕین( هاوسەرگیری ):** ئەگەر خۆی بەزاوا بینی بەڵام ژنەکەی نەبینی‌و نەیناسی‌و ناوی نەبرا، دەمرێ یان مرۆڤێك دەکوژێ.

* ئەگەر ژنەکەی دیاریکردو ناسی یاخود ناویبرد وەك هاوسەرگیری وایە.
* ئەگەر بینی هاوسەریگرت دەستەڵاتو فەرمانڕەوا بەئەندازەی چاکەی ژنەکە بەدەستدەهێنێ لەگەڵ واتای ناوەکەی‌و شۆخ‌و شەنگی‌و جوانی.
* ئەگەر بینی لەهاوسەرەکەی جیابوەوە لەدەستەڵاتەکەی دوور دەخرێتەوە.
* ئەگەر بینی ژنێکی داوێنپیس دەبینێ پیشکێکی حەرام لەدنیادا بەدەستدەهێنێ.
* هەموو جۆرەکانی مارەبڕین لەخەودا ئەگەر خاونەکەی ئاوی هاتەوەو خۆشتن بەپێویست گەڕا لەسەری خەوێکی پووچ‌و بەتاڵە.
* ئەگەر بینی چوە لای ژنێکی ناسراو خانەوادەکەی خێر لەدنیایان بەدەستدەهێنێت، ئەگەر نەچوە لای‌و جووت نەبوو لەگەڵی بەڵام ماچ‌و دەستبازی لەگەڵکرد دەوڵەمەندی خانەوادەکەی کەمتر دەبێ چونکە چوونە لای باشترو کاریگەرترە.
* ئەگەر بینی یان خەویان پێوە بینی دایکی مارەبڕی یاخوشکەکەی یاکەسێکی مەحرەمی ئەم خەوە کەسێك دەبینێ رایەڵەی خزمایەتی پچڕیوەو مافی کەسەکانی نەداوەو بەسەریان ناکاتەوە.
* ئەگەر بینی ژنەکەی زۆر لەخۆیدەکات‌و پاڵکەوتوە لەگەڵ پتر لەحاڵی بێداری‌و واژووی سروشتی نێوانیان ساڵێکی پڕ فەڕپیت روویان تێدەکات، ئەگەر ژنێکی نادیاربوو بەهێزتر دەبێ.

*ئەگەر بینی کوڕێکی لاوی نادیاری مارەبڕی‌و بکەر زەفەر بەدوژمنی دەبات بەهەمان شێوە ئەگەر مارەکراو ناسراوبوو یان ئاژاوەو ناکۆکی هەبوو لەنێوانیاندا وەك لێکدانەوەی پێشوو دەبێت. ئەگەر ناسرابوو بەڵام ناکۆکی‌و شەڕو ئاژاوە لەنێواندا نەبوو کارلێکراو لەبکەرەوە خێری دەستگیردەبێت.

*ئەگەر مارەکراو پیرێکی نادیاربوو ئەوپیرە باپیرەیەتی‌و خێرەکەیەتی دەیکات بۆ باپیری باشەو پێیدەگات‌و بەهەمان شێوە ئەگەر بینی پیاوێك ماچدەکات یاخود لەگەڵی جووتدەبێ یا تێکەڵی دەبێت ئەگەر ئارەزوو هەبوو لەنێویاندا بەو شوێوەیەیە کەباسکرا، بەڵام لەهێزو ئەندازەدا خوارترە.

*ئەگەر بینی ماچی پیاوێکدەکات نەك بەئارەزوو شەهوەتەوە بکەر لەکارپێکراوەوە خێرێ دەستگیر دەبێت‌و لێی وەردەگرێ.

*ئەگەر بینی دووگیانبوە زیادبوونی دنیایەتی.

*ئەگەر بینی کچیبوو خێر بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی ئاژەڵێك مارە دەبڕێ‌و ئاژەڵەکە ناسراوە خێری خۆی دەگەیەنێت بەکەسێك لەو پەیوەندییەدا وابەستە نییە، ئەگەر ئاژەڵەکە نادیاربوو زەفەر بەدوژمنێك دەبات.

*ئەگەر باڵندەو ئاژەڵی درندەی مارەبڕی بەدەر لەمرۆڤ بەهەمان شێوەیە.

*ئەگەر مردوویەکی ناسراوی مارەبڕی بکەر لەکارپێکراو خێرو دوعاو پەیوەندی بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر مردوویەکی مەحرەمی مارەبڕی بکەر خێردەگەیەنێت بەکارلێکراو لەپارەو دوعاو یارمەتی.

*ئەگەر مردوویەکی ناسراوی بینی مارە دەبڕێ لەزیندوویەك خێر دەگات بەمارەکراوو لەمردوەکەو میراتگرەکانیەوە.

*ئەگەر بینی شوویکردوە بەژنێکی مردوو و چوە لای زەفەر بەکارێکی مردوو دەبات‌و لەکاروبارەکاندا بەئەندازەی جوانی ئەو ژنەیە، ئەگەر نەچوە لای زەفەری بۆئەو کارە بەئەندازەی چوونەلایەتی.

*ئەگەر بینی شوویکرد بەپیاوێکی مردوو چوە لای لەماڵی خۆیان کەمبوونی ماڵ‌و سامانیەتی‌و گۆڕانی حاڵ‌و بارو یەکلاییبوونەوەی کاروبارەکانیەتی.

* ئەگەر مردووەکە لەلانەو ماڵی خۆیدا چوە لای زیندوو دەمرێ.
* ئەگەر ژنێکی مێرددار بینی شوویکردوە بەیەکێکیتر خێرو چاکەی دەستگیردەبێت.
* ئەگەر پیاوێکی هاوسەردار بینی ژنێکی تری هێناوە دەستەلات بەدەستدەهێنێ.
* ئەگەر ژنێک بینی مردوویەك مارەیبڕیوە خێری دەستیگر دەبێت لەشوێنێکدا خوازیارینەبوە.
* ئەگەر لەدواوە چوە لای ژنێك هەوڵی بەجێهێنانی کارێکدەدات لەروویەکی ترەوە.
* ئەگەر بینی دەچێتە لای ژنانی پادشاو سەرۆکەکان یاخود جووتدەبێ لەگەڵیان حەرام دێتە رێی.
* ئەگەر بینی ژنەکەی کەوتوەتە خولی مانگانەوە کاروبارەکانی لێدادەخرێ، ئەگەر پاکبوەوە ئەوکاروبارەی بۆ ئاوەلا دەکرێ، ئەگەر جووتبوو لەگەڵی کاروبارەکانی بۆ سووكو ئاساندەبێت.
* ئەگەر بینی خۆی تووشی خولی مانگانە بوە دەچێتە لای مەحرەمێك، ئەگەر لەشگرانبوو کاروبارەکانی تێکەڵ دەبن بەسەر یەکدا.

* ئەگەر خۆی شتو جلوبەرگی لەبەرکرد لەو حاڵە قوتار دەبێ.
* ئەگەر بینی هاوسەرەکەی ریشی هەیە ئەو ژنە هەرگیز منداڵی نابێت، ئەگەر کوڕی هەبوو کاروباری خانەوادەکەی دەبات بەڕێوە.

(قەیرەوانی) دەڵێت: مارەبڕینی ژنی نادیار ئەگەر مارەبڕ نەخۆشبێت دەمرێ، ئەگەر بێداربوو گرێبەستی دەستەلات دەبەستێ یاخود شایەتی لەسەر کوژراوێك دەدات چونکە ژن دەستەلاتدارەو چوونە لای وەك کوشتن وایەو ئامرازی نێرینە وەك خەنجەرو رم وایە بەتایبەت پچڕاندنی پەردەی کچێنیو خوێن لێهاتنی ، ئەگەر ناسراوبوو یان باوکی پیاوێکی پیربوو لەدنیادا گرێبەستی حاڵێك دەبەستێ کڕینی ماڵ یان دوکان یاخود گرتنی خزمەتکار یاخود کاڵایەك دەکڕێ یان بڕێك پارەی دەستگیردەبێ چاوی پێی گەشدەبێ.
* بەلام دواخستنی کاتەکەیو چوونەلای خێرا بەدەستهێنانی ئەوەیە کەدوایخستوە. جووتبوون لەگەڵی بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی ویستو خوازیان ئەوەی خوازیاریەتی لەئاینو دنیا وەك سەفەرو کێڵگەو چوونە لای

دەستەڵاتدارو سواربوونی کەشتیو گەڕان بەدووی شتی ونبوودا چونکە جووتبوون تامو چێژو سوودی تێدایە، ئەگەر لەگەڵ ژنەکەی جووتبوو خوازوهیواکانە بەدەستیدەهێنێ یاخود ژنەکەی ئەوەی دەیەوێت دەستی دەکەوێ.

* مارەبڕینی مەحرەم ئەگەر جوتبوو لەگەڵیا پەیوەندیو خەڵاتو بەخششە بەتایبەت لەدایکەوە دوای لەیەك پچڕانو گەڕانەوەی بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتوەتە دەرەوە بەخەرجیو رووتێکردنەوە دوای رێگرتن مەگەر لەمانگەکانی (حەج)دا جووت بێت لەگەڵیان یاخود لەخەوەکەدا شتێکی تێدابێت بەڵگەبێت لەسەری ئەوجا دەچێتە خاکی (مەککە)و (مەدینە)و خواستو داوای خۆی بەجێدەهێنێ، ئەگەر تامو چێژی وەرگرت ئەوجا نوتفەو ئاوەکەیماڵەکەیەتی لەخەرجی ئەو رێیەدا دەبینێتەوە.

* ئەگەر مەنی بەدەست یان جلەکانیەوە بینی ماڵو سامان بەدەستدەهێنێ لەکوڕەکەیەوە یان کەسێکیترەوە.

* مارەبڕینی ئاژەڵی ناسراو بەڵگەیە لەسەر چاکە لەگەڵ ئەوەی کەنایبینێت یاخود خەرجیە، ئەگەر نادیاربوو زەفەر دەبات بەوەی ئەو ئاژەڵە بەڵگەیە لەسەری لەلایەن خۆشەویست یان دوژمنەوە.

* جووتبوون لەدواوە لەخەودا داواکردنی کارێکی قورسوگرانە لەرووگەی بەدەر لەخۆیو دەگونجێت بۆی بەجێنەیەتو ماڵو خەرجی بەسەربچێتو کردارەکانی پەرتەوازە ببن چونکە پاشەوە مەنی تێناکرێو هیچ سوودو کەڵکی نییە بەشێوەی پێشەوە.

* جووتبوون لەجێگەو لێفەیەکدا لەگەڵ تێکەڵبوون وەك مارەبڕینو ماچکردن وایە.

* ئەگەر بینی چوار ژنی هێناوە خێرێکی زۆری دەستیگردەبێت، خوداوەندە دەفەرموێت: ﴿ فَانْكِحُوا مَاطَابَ لَكُمْ مِنَ النِسَاءِ مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعِ ﴾ (النساء: ٣).

* ئەگەر بینی ژنەکەی شوویکردوە بەکەسێکیترو بردویانە بۆ موڵكو دەستەڵاتەکەی تیادەچێتو بازرگانیەکەی پوچەڵدەبێت.

* ئەگەر بینی ژنەکەی مارەبڕی پیاوێکیترە ئەو پیاوەی برد بۆلای

ژنەکەی بازرگانیەکی بەسوودو قازانج ئەنجامدەدات.

* ئاهەنگو شاییگێڕان بەڵاو نەهامەتییە بۆ یەکێك ئەنجامیبدات، ئەوەی بانگبکرێ بۆی خۆشیو شادییە ئەگەر خواردنی نەبینی.

* دەگێڕنەوە پیاوێك هات بۆ لای (ئیبن سیرین) پێی وت: لەخەودا دایکم مارەبڕی پاشان خوشکم، (ئیبن سیرین)وەڵامەکەی بۆ نووسیو وتی: ئەم پیاوە لەچاکەکردندا رژدو بەخیلەو بۆ دایكو خوشکی خراپە.

* ئەگەر بینی فەرمانڕەوا مارەیکردوە دەستەڵات بەدەستدەهێنێ، ئەگەر پیاوێك لەنێو خەڵکیدا مارەیبڕی دەرووی لێدەکرێتەوەو لەغەمو پەژارەو نەخۆشیەکانیو چاکدەبێتەوە.

* ئەگەر بینی پیرێکی نادیار ژنەکەی مارە دەبڕێ سوودو قازانجو زیادە بەدەستدەهێنێ چونکە پیر باپیرەیەتی، ئەگەر لاوێك مارەی بڕی دوژمنێکی خزمەتێکیدەکاتو هانیدەدات لەسەر ستەمو زۆرداری لەمامەڵەدا.

* ئەگەر مارەکراو زیندانیبوو ئازاددەکرێ.

* ئەگەر بینی دایکی مردووی مارە دەبڕێ لەگۆڕەکەیدا دەمرێ بەپێی ئایەتی: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ﴾ (طه: ٥٥).

* ئەگەر بینی کچێکی مارەکرد خێروچاکە بەدەستدەهێنێ.

* ئەگەر بینی ژنێك بەشێوەیەکی نادروست مارە دەبڕێ داوای کارێکدەکات لەروویەکی بەدەر لەرووی خۆیەوەو سوودی لێوەرناگرێ.

* ئەگەر پیاوێك بینی خزمەتکارەکەی مارە دەبڕێ زیادەو نەخۆشی بەوی هەیەتی بەدەستدەهێنێ.

* ئەگەر خزمەتکارەکەی جووتبوو لەگەڵی سووکایەتی پێدەکات.

* شکاندنی شەقڵی کچێنی چارەسەرکردنی کاروباری قورسوگرانە وەك جەنگو ئازادکردنی وڵاتانو هەڵکەندنی بیرو داواخوازی گەنجینەیانو گەڕان بەدووی زانیاریداو دانایی نادیارو خۆخستنە نێو سەرجەم کاروبارە تەنگەبەرەکان.

* ئەگەر ئاوەڵایکرد لەبەدەستهێنانی داواکەیدا سەرکەوتوودەبێت، ئەگەر ئامرازی نێرینەی شکا لەداواکەیدا لەحاڵی بێداریدا بەدەستیدەهێنێ.

* هاوسەرگیری لەگەڵ نێرینەدا بەم شێوەیە:
+ئەگەر گەنج و لاوبوو مارەبڕ زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکەیدا.
+ئەگەر پیربوو زاڵدەبێت بەسەر باپیرەی و بەخت و شانسی بەرزدەبێتەوە.
+ئەگەر ناسراوبوو مارەبڕ زاڵدەبێت بەسەریاو ستەمی لێدەکات و هەڵدەکوتێتەسەری.
+ئەگەر منداڵبوو سواری شتێکدەبێت کەبۆی گونجاو نییە.
* ئەگەر مارەبڕ هاوڕێیبوو کارێکی دەخاتە بەردەم نەیزانیوە، ئەگەر بەوستوخوازی خۆییبوو خێری لەبکەر دەستگیردەبێت و بکەرو کارلێکراو لەگەڵ کەسانیتردا هاوبەشدەبن و لەسەرکارێکی نەخوازراو کۆدەبنەوە.
* مارەبڕینی مردوو کارلێکراو خێری لەبکەرەوە پێدەگات، بەڵام زیندو دەگونجێت میراتیەکەی بەدەستبکەوێ یان لەکەسێکی خانەوادەی ئەو مردوە.
* ئەگەر مارەکراوی مردو نادیاربوو کارێکی مردووی بۆ زیندوو دەبێتەوە خوازیارییبوە، یا زەوییەکی وێران ئاوەداندەکاتەوە یا بیرێکی تەپیو هەڵدەداتەوە یاخود زەوی مردوو دەکێڵێ یان داوایەکی مردووە بەهۆی بوونی کەش و بارو لایەنگر بەدەستیدەهێنێت، مەگەر ئامرازی نێرینەی لەکاتی جووتبووندا لاوازببێ یاخود لەکاتی ئارەزوودا تەمبەڵ و سستبێت، ئەوجا هەوڵدەدات بەلام ناتوانێت، بەلام مارەبڕینی مردوو بۆ زیندوو ئەگەر نەخۆشبوو یان نەخۆشی هەبوو پێیدەگات، وەگەرنا پەرتەوازەیی لەماڵەکەیدا بەرپا دەبێ یان نەخۆشی و ناتەواویەك لەجەستەو لەش و لاریدا دیاریدەدات مەگەر لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەو شتێکی تێدابێت نیشانەبێت لەسەر چاکسازی وەك ئەوەی پێی بڵێ: من مردوونیم یان لەگەڵ ئەوەدا کاوجۆی بداتێ ئەوجا خێرێك زیندوو دەبێتەوە چاوەڕێی نەبوە یان نائومێدبوە لەوەرگرتنی یاخود لەپیاو ئەگەر بێوەژن بێت یاخود لەکەسێکی ئاوارە کەبگەڕێتەوە لای گەر ئاوارەی هەبێ.
* ئەگەر ژنێك شوویکرد بەپیاوێکیتر لەخەودا سوودە رووی تێدەکات یا روودەکاتە خانەوادەکەی یاخود مێردەکەی سوودو قازانجدەکات لەشەریکەکەی یان کوڕێك یارمەتی

دەدات‌و هاوكاریـدەبێت‌و رەنجـی بـۆ دەدات.

* ئەگــەر لەخــەودا ژنەكــەی خــۆی مارەكرد سەركەوتوو دەبێت لەكاروباری پیشەكەیدا ، ئەگەر بینی لەشگرانە كاروبارەكــانی ئــاڵۆزو تێكەڵــدەبن بەســـەریەكدا، ئەگـــەر خۆیـــشت لەسـەرجەم ئـەوەی هـاتوە بەسـەریدا قوتاردەبێ.

(نابلـسی)دەڵێـت: بەڵگەیـە لەســەر پلەوپایــەی بــەڕێزو چــاك، هــەموو هاوسەرگیریەك مەنی تێدا بەدی بكرێ‌و خۆشـۆردن بەپێویست بگەڕێ لـەكاتی بێداریدا بەتاڵە چونكە لەشگرانییە.

* ئــەوەی دوژمنەكــەی مــارەببڕێ زاڵدەبێت بەسەریا.

* ئەگـەر یـەكێك لـەبراكانی مـارەكرد چاكەی لەگەڵ ئەنجامدەدات.

* هـەروەها گـوتراوە: ئەگـەر پیاوێـك مارەبكـات لەســەر نــەزانین لەگــەڵی هاوڕادەبێت.

* ئەگـــەر دایـــك‌و خوشـــك‌و هەنـــدێك لەمەحرەمـــەكانی مـــارەكرد لەمانگـــە یاســاغەكاندا روودەكاتــە (مەككــە)ی پیرۆز.

* ئەگەر پیـاوێكی نەناسراوی مـارەكرد زیـادەڕەویی دەكـات لەخـەرجی مـاڵ‌و ساماندا.

* ئەگـەر بـاوكی مـارەكرد چـاكدەبێت لەگـەڵی‌و كەسـێك خـراپ بێـت لەگـەڵ باوكی خەوی لەو جۆرە نابینیّ.

* ئەگـەر لەگۆڕەكـەیا دایكـی مـارەكرد دەمرێ.

* ئەگـەر دوژمنێكـی بێبـاوەڕ كیـژێكی موسـوڵمانی مـارەكرد بەڵگەیـە لەسـەر هەڵمەتبردنەسەر ئەو شـوێن‌و جێگەیـە، بەهەمان شێوە ئەگـەر موسوڵمان ژنـی دوژمنـــی هێنــا هەڵمەتبردنــە بۆســـەر دوژمن.

* مارەبڕین بەڵگەیە لەسەر قەرزدانەوەو دەرووی خێـر بـۆ رەواندنـەوەی غـەم‌و پەژارە.

* ئەگەر بینـی فـەرمانڕەوا مـارەی بڕی دەستەلات بەدەستدەهێنیّ.

* ئەگەر باڵندەیەكی مارەبڕی زاڵـدەبێت بەسـەر دوژمنەكەیـدا، ئەگەر باڵندەكـە ناســراوبوو چــاكە لەگــەڵ كەســێكی نەناسراو دەكات.

* ئەگـەر ئـاژەڵێكی مـارەبڕی خێـری دەستگیردەبێت لەسـەر ویست‌وخوازی خۆی.

*ئەگەر ویستی ژنێك مارەببڕیٚ بەلاٚم پیاو دەرچوو ئەگەر خوازیاری دەستەلاٚتبێت بەدەستیناهێنێتو ویستو خوازی بۆبەجیٚ نایەت، ئەگەر لەخەڵکی گشتییبێت دنیای قورسوگراندەبیٚ.

*ئەگەر ژنێکی رووتی مارەکرد لەغەمو پەژارە قوتاردەبیٚ.

*ئەگەر ئاژەڵێکی درندەی مارەبڕی زاڵدەبێت بەسەر دوژمندا هەرکەسێکبێت.

*ئەگەر دەڵەشێرێکی مارەکرد لەگرفتو نەهامەتی زۆر قوتاردەبێتو ناوبانگی بەرزدەبێتەوەو دەبێت بەکەسێکی بەویقارو توانای ئومێدەوار.

*ئەگەر درندەبوو کاری نابەجیٚ لەدوژمنی دەبینیٚ.

*ئەگەر بینی کیژۆڵەیەکی مارەکرد شقڵی کیژێك دەشکێنیٚ.

*ئەگەر پڵنگێکی مارەکرد زاڵدەبێت بەسەر ژنێکدا لەنێو گەلو نەتەوەیەکی ستەمکاردا.

*ئەگەر بینی قاچێکی مارەکرد بۆئەویتر کەسێکی خزمی خۆی دەهێنێت.

*ئەگەر بینی ژنەکەی مارە دەکات زاڵدەبێت بەسەر کاروبارو پیشەکەیدا.

*ئەگەر ژنانی بەهەشتی مارەکرد کاروباری ئاین جوانی بەدەستدەهێنیٚ.

*ئەگەر حۆریەکانی بەهەشتی مارەکرد لەئاینەکەیدا هەواڵی خۆش دەبیستیٚو هەواڵێك بەنهێنی دەبیستیٚ ئەگەر کچکە دیاربوو خێرێکی بەرچاوە وەك زەکاتو جیهاد.

**مارەیی**:(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا مارەییەکیدا بۆ شتێکی نادیار لەبێداریدا رۆژوو نوێژ (حەج) ئەنجامدەدات.

**مازوو( سیچکە )**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵو سامانێکی نەشونماکارەو دەمێنێتەوە.

**ماستاو**:(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکە بانگەشەی دەبێتو دڵفراوانی دەکاتو فەرمان بەپێدانی زۆر دەکات.

**ماسی**:پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم لەسەر خوانێکم ماسی لەسەردانراوە منو خزمەتکارەکەم لەسەرو ژێریمان دەخوارد، ئەویش وتی: وریابە خزمەتکاران خیانەتت لێدەکەنت، کاتیٚ چاودێریکرد بینی بەو چەشنەیە.

*ماسی سوێری سوورەوکراو سەعەرە لەپێناوی زانیاریو هاوەلاٚیەتیکردنی

سەرۆكێك بەپێی ئایەتیو ﴿ نَسِيَا حُوتَهُمَا ﴾ (الكهف: ١٦).

*ئەوەی ماسییەكی تازەی سورەوەكراو بەدەستبهێنێت دەستكەوتو خێر بەدەستدەهێنێت بەهۆی چیرۆكی حەزرەتی (عیسا) لەسوورەتی (مائدة)دا.

*ماسی سورەوەكراو بەجێهێنانی پێداویستیو وەلآمدانەوەی داوایە یاخود رزقو رۆزییەكی فراوانە ئەگەر ئەوكەسە خواناسبێت، وەگەرنا سزایەكە دادەبەزێ بەسەریا.

*ئەگەر ماسی بچووكبوو لەنێوئاوداو لەرۆندا سووریكردەوە ماڵو سامانەكەی لەشتێكدا خەرجدەكات هیچ سوودو قازانجێكی لێناكات هەتا بەهاونرخ پەیدابكاتو خۆشو بەتامبێت.

*هەروەها دەڵێن: ماسی باشە بەتایبەت ئەگەر سوركرابوەوە بەدەر لەو ماسییە بچووكانەی دڕكیان زۆر تێدایە بەڵگەیە لەسەر دژایەتی لەنێوان خۆیو خانەوادەیو بەڵگەیە لەسەر خوازیاربوونی شتێك بەدەستیناهێنێت.

*خواردنی ماسی سوێر بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانج لەو دەموكاتەدا.

*هەروەها ئەگەر ماسییەكە تازەوگەورەو زۆربوو ماڵو سامانو دەستكەوتە بۆ یەكێك بەدەستیبهێنێت.

*وردە ماسی غەمو پەژارەیە بۆ ئەوەی بەدەستیدەهێنێتو وەك منداڵ وایە.

*ئەگەر ماسیەكی تازە یان دوان بەدەستبهێنێت ژنێك یان دوان دەهێنێت.

*ئەگەر لەسكی ماسیەكەدا گەوهەری دییەوە كوڕێكی لێدەبێت.

*ئەگەر لەسكیدا چەوری بینی ماڵو سامانو خێری دەستگیردەبێت.

*ئەگەر ماسیەكی سوێری گرت غەمو پەژارەی دەستگیردەبێت بەهۆی سوێرییەكەیەوە.

*ماسی بچووكیش خێری تێدا نییە.

*ئەوەی ماسی لەدەمی بێتە دەرەوە قسەیەكدەكات دەربارەی ژنێك مەحاڵو ئەستەمە.

*ئەگەر بینی ماسی لەئامرازی زاوزێی دێتەدەرەوە كچێكی دەبێت.

*ماسی زیندووی تەڕ كچە.

*راوی ماسی لەوشكانیدا ئەنجامدانی كارێكی خراپو نابەجێیە.

*هەروەها دەڵێن: هەواڵێكی خۆشە ، راوی ماسیش لەئاوی لێڵدا

غەم‌وپەژارەیەکی توندە، بەڵام راوی ماسی لەئاوێکی روون‌و بێگەردا رزق‌و رۆزییە یاخود کورێکی خۆشحاڵ‌و بەختیاری دەبێت.

*ئەوەی ماسیەکی زیندو بخوات موڵك‌و دەستەڵات بەدەستدەهێنێت.

*ماسی برژاوی تازە دەستکەوت‌و خێرە بەپێی چیرۆکی حەزرەتی (عیسا) لەسوورەتی (المائدة)دا.

*هەروەها دەڵێن: بەجێهێنانی پێداوستییە یان وەڵامدانەوەی داوایەکە یاخود رزق‌و رۆزییە ئەگەر ئەو پیاوە خواناس‌و پارێزکاربوو، وەگەرنا سزاو خەشم‌وقینە.

*ماسی سوێری سوورەوەکراو سەفەرە لەپێناوی زانیاری‌و زاناییدا بەپێی ئایەتی: ﴿ نسيا حوتهما﴾(الكهف:٦١)

*ئەگەر بینی وردەماسی لەئارد هەڵکێشاو پاشان سووریکردەوە ماڵێك چاکدەکات سوودو قازانجی لێوەردەگرێت‌و ماڵێکی باش خەرجدەکات لەوپێناوەداو ماندوەبێت هەتا ماڵێکی پاك‌و بێگەردی دەستدەکەوێت.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا ماسی ژمارەکەی ئەوە ژنە ئەگەر نەیزانی چەندە ئەوە ماڵێکی دەستکەوتوە.

*ئەهەنگ وەزیری سەرۆك‌و فەرمانڕەوایانە ، چونکە دەریا پادشاو سەرۆکەو ماسیش لای سەرۆکە، ئەگەر ماسیەکە تەڕو زیندوبوو ئەوە کچێك دەهێنێت.ماسی زۆریش دەستکەوتێکی قێزەونە، هەروەها ماڵێکی زۆر بێشومارە لەلایەن فەرمانڕەوایەکەوە پێیدەگات دەترسیّ لێی بپرسێتەوەو سزای بدات.

*ئەگەر بینی ماسیەکی گەورەی راوکرد بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانج‌و خێر.

*ئەگەر ماسی بچووکی راوکرد بەڵگەیەلەسەر رەواندنەوەی تام‌وچێژو سوود.

*پوولەکەی ماسی ئەگەر نەرمبوو بەڵگەیە لەسەر خێر بۆ یەکێك بیەوێت فرۆفێڵبکات‌و ئەوجا باس‌وخواسی وندەبێت پاش ئەوەی ماڵ‌وسامانی خەڵکی بەفرۆفێڵ داگیردەکات، بۆسەرجەم خەڵکیش بەڵگەیە لەسەر ئاڵۆزی کاروبارەکانیان‌و هێواشی‌و لەسەر خۆیی.

*ماسی بونیش بەڵگەی خێرە بۆ یەکێك بیەوێت هاوسەرگیری

ئەنجامبدات، بۆیەکێکیش بیەوێت هاوبەشی کەسی دیبکات.
*ماسی بێ پوولەکەو سەرجەم ئەو ماسیانەی لەو ڕەگەزەیەو درێژە بەڵگەیە لەسەر کاروپیشەی بەتاڵوپووچ لەگەڵ ماندوبوون و شەکەتی چونکە لەدەستدەخزێ.
*ئەو ماسیەشی لەبەرچاوبێت بەڵگەیە لەسەر خێریکی کەمو کورت.
*ئەگەر مرۆڤ ماسیەکی مردووی بینی لەنێو دەریادا ئەوە بەڵگەیەکی خراپە بەتایبەت بەڵگەیە لەسەر ئومێدەواربوونی شتێك کەوا بەدەستتنایەت.
*ئەگەر ماسیەکی زیندوی بینی لەئاو دەریهێنا یان کەسێکیتر دەریهێناو دەیخوات بەڵگەی سوودو قازانجە.
*ئەگەر ماسیەکی بینی لەجێی خۆیدا بەڵگەیەکی خراپە بۆئەوەی بەنێو دەریادا دەڕوات، بۆیەکێکیش نەخۆشبێت کەبەدەریادا بڕوات نارەحەتیەو نەخۆشیش ئێشو ئازاری بەسوێو توندوسەختردەبێت.
*ئەگەر ماسیەکی لەسەر جێگەکەی بینیو لەسەردابوو بەدەریادا تێدەپەڕێ بەڵگەیە لەسەر نارەحەتیو ترسی نوقمبوون هەیە.

*ماسی سوێر بەڵگەیە لەسەر خێرو چاکە لەگەڵ ماڵو سامانێك بمێنێتەوە، چونکە سوێری ماسی دەپارێزێ لەخراپبوون.
*هەروەها دەڵێن: غەمو پەژارەیە.
*ئەگەر ماسی گەورەو بچووکی بینی هیچی تێدانییەو بەڵگەیە لەسەر رزق‌ورۆزی.
*ئەگەر بەشێکی ماسی برد لەسەربازەکانی فەرمانڕەوا شتێکدەبات.
*ماسی ئێجگار گەورە ئەگەر گیراو هەڵچوو دەستدرێژیکار تیادەچێت.
*ئەگەر بینی لەماسی فرۆشێك ماسیەك دەکرێ کچێکدەهێنێت یان ژنێك.
*ئەگەر بینی ماسیەکی بۆگەندەهێنێتو خواردنێکی پاكو پوخت دەخاتە بەردەستی مارەبڕینێکی حەرام ئەنجامدەداتو ژنانی حەلاڵ ڤازلێدەهێنێ.
*ئەگەر داوای نەهەنگێکیکرد لەحەوزێکدا یا لەگولاوێکدا بەلام لەدەستیچوو کەسێکی رکەبەری دەیەوێت نکوولی لەماڵو سامانی بکاتو ناتوانێت بەدەستی بهێنێتەوە مەگەر بەشەڕو ئاژاوەیەکی زۆرنەبێت.

*ئەگەر نەهەنگێکی لەحەوز یا ئەستێڵێکدا بینیو وشکیکردەوە زیندانیدەکرێت.
*ئەگەر ماسیەکی دڕکاوی توێکڵداری هەڵدڕی زیوێکی هەڵگیراوە یاخود ئاڵتونێکە مافی خودای لێنادرێت چونکە خواردنی حەلاڵ نییە.
*ئەگەر ماسیەکە چەکێکی پێوەبوو بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتنی بەسەر دوژمناندا، دەگونجێت هاوەڵایەتی خەڵکی شەڕەنگێز بکات، ئەگەر یەکێکبوو نەیدەتوانی ئەوەشتومەكو کالآیە بۆ تەمادارانی.
*ئەگەر ماسیەکی بینی لەئاوێکی شیرینەوە دەچوو روو بەئاوێکی سوێرو بەپێچەوانەوە بەڵگەیە لەسەر دووڕوویی لەسوپادا یاخود جیاوازی خەڵکی گشتی لەسەر روودانی ستەمکارییەك یان کەوتنەوەی بیدعەیەك.
*ئەگەر ماسیەکەی لەسەرڕووی ئاو بینی بەڵگەیە لەسەر ئاسانبوونی کاروبارو نزیکبوونەوەی کاروباری دوورو دەرکەوتنی پەنهانو نهێنی لەگەڵ دەرکەوتنی کاری شاراوە یاخود میراتی.
*ئەگەر ماسی بچووكو گەورەی بینی بەڵگەیە لەسەر گرنگیدان بەئاهەنگو شیوەن یاخود ئەوەی پێویست بەکۆبوونەوە دەکات لەخەڵکی چاكو خراپ.
*ئەگەر ماسیەکی بینی لەمرۆڤدەچوو یان لەباڵندە بەڵگەیە لەسەر داننان بەبازرگانو ئەوانەی لەدەریاوە هاتوچۆدەکەن یاخود زمانزانان یان رەوشتپارێزان.
*ئەگەر شتێکی بینی دڵی پێخۆشبوو یاخود زیندەوەرو گیانداریکی وەك کیسەڵ بەڵگەیە لەسەر چاکەکردن لەگەڵ هەتیواندا یان نەیارانو لەخۆگرتنیان.
*ئەگەر بینی ماسیەکی لەقووڵایی دەریادا راوکرد دەگونجێت لەپیشەکەیدا تواناداربێتو رزقو رۆزییەکی بێشوماری دەستگیربێت، وەگەرنا دەستدەبات بۆ ماڵی دەستەلآتداران یاخود دەبێت بەسیخوڕ.
*ئەگەر دەریا دەرکەوتو ماسیەکی گەورەی دەرهێنا ئاگاداری لەزانیاریەکی خوداوەندا دەبێتو ئاینی بۆڕووندەبێتەوەو رێنوێنی دەکرێ بۆ رێگەیەكو دەرەنجامی کاروبارەکانیشی کۆتاییدێت، ئەگەر ماسیەکە گەڕایەوە نێو دەریا هاوەڵایەتی پیاوچاکان دێتەوەو ئاگاداری ئەوە دەبێت کەس ئاگای لێنییەو ئەگەر ویستی سەفەر

بكات كەسانێكدەبن بەهاوەڵی نەرمو نیانو بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی.
*ئەگەر لەماسیەكەوە شتێكی وای دی لەدوورگەیەك دەچوو دەستكەوتی دەستدەكەویّ بەهۆی جیهادو تێكۆشان یاخود هاوەڵایەتیكردنی لەگەڵ میرێكدا ئەگەر لەچاوی ماسیەكە رۆنی دەرهێناو لەگۆشتیخوارد،ئەگەر لەماسیەكەیخوارد بەبێچاككردنی سەبارەت بەئابرووی خەڵكیدەدوێتو بەفروفێڵ دەستدەگریّ بەسەر ماڵو سامانیاندا.
*دەگونجێت خواردنی گۆشتی ماسی بەبێچاككردنی بەڵگەبێت لەسەر:
+زینا.
+نەخۆشیەكی توندی سەختی هێواش وەك ئیفلیجیو هاوچەشنەكانی.
*ئەگەر ماسیەكەی لەسەر زەوی بینی بەڵگەیە لەسەر گواستنەوەی كاروپیشەی لەكاری نێودەریاوە بۆ وشكانی، ئەگەر واتەبوو ماڵوسامان بەدەستدەهێنێتو زانیاری دەرباری پێداویستی دەستدەكەویّ یاخود خانەوادەو خزمەكانی یەكدەگرنەوە.
*هەر ماسیەك بەڵگەبێت لەسەر مرۆڤ بینی بەڵگەیە لەسەر بژێوی پەیداكاران لەئاودا وەك كەشتیەوانو ئاودێرو ئاتری حەمام.
*ئەگەر لەئاسمانەوە ماسیەكی برژاوی بۆ دابەزی مژدەیە بەگیرابوونی دوعاو سەركەوتنی بەسەر دوژمنداو بەرزبوونەوەی پلەوپایەی.
*دەگونجێت بینینی ماسی بەڵگەبێت:
+غەمو پەژارە.
+نەخۆشی.
+مردن لەو شوێنەدا خەونەكەی تیادەبینیّ.

**ماسی سوورەوكراو**:(نابلسی)دەڵێت: ماسی سورەوەكراو یان مریشك ماڵوسامانی پەیداكراوە یاخود گەنجینەی هەڵگرتنی شتومەكە بۆ رەبەن هاوسەرەو چارەسەریشە بۆ نەخۆش.
*ئەگەر چەوری تێدابێت ئەوە ماڵو سامانە لەلایەن ژنانەوە.

**ماسیگر**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێكە مرۆڤ بەكۆیلەدەكاتو دەیفرۆشێت یان بەگەڕیدەخات لەبەرژەوەندی خۆیدا چونكە ماسی كچ یان ژنە.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شەڕو کێبەرکێو غەمو پەژارەو دەروو لەدوای نارەحەتی.

*فرۆشتنی ماسی بەتەڕی بەڵگەیە لەسەر:

+فرۆشی گەوهەروو دوڕو مەرجان.

+ڕزق‌و ڕۆزیو ماڵی حەلاڵ.

+زانیاریو ماندوبوون.

+فروفێڵ.

+دەرخستنی نهێنی.

**ماسیە دەعموس:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: سرینەوەیە، لەخەویشدا پیاوێکی نەفرەتلێکراوی لووشەیە.

**مافی کرین بەرلەکەسانیتر:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+ڕێکەوتن لەگەڵ دوژمناندا.

+هاوسەرگیری بۆکەسی ڕەبەن.

+پارێزگاری لەنوێژەکان.

+کوڕو ماڵو سامان.

**ماڵ( لانە ـ خانوو ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵو لانە بەڵگەیە لەسەر خاوەنەکانی ، ئەو رووخانو تەنگیو فراوانیەی تێدایە یاخود خێرو شەڕی نێوی دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنو جێنشینانی، دیوارەکانیش پیاوانن، سەربازیش ژنە.

*لانەو ماڵی پیاو بەڵگەیە لەسەر لەش‌و خودی چونکە بەهۆی ئەوەوە دەناسرێو بەشکۆمەندیو ناوو پەردەی دانراوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو ماڵەی کەبژێویو کاروباری پێدەچێت بەڕێوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر جلوبەرگی پۆشراو.

*ئەگەر لەش‌و لاریبوو دەرگاو رووخسارێتی، ئەگەر هاوسەرەکەی بێت دەرگاکەی عەورەتیەتی، ئەگەر دنیاو ماڵو دارایبوو دەرگاکەی دەرگایەتی بژێویو ژیانی پێدەستگیردەبێت، بەڵام ئەگەر جلو بەرگەکەی بێت دەرگاو دەوربەرەکەیەتی.

*دەگونجێت دەرگا ئەگەر جیابکرێتەوە لەلانەو خانوو بەڵگەبێت لەسەر خاوەن ماڵ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرئەوەی دەرگا دادەخاتو دەیکاتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نێرو مێ بەشێوەو رووخسار، ئەوەی داخراوبێت نێرینەیە ئەوەشی دەسکو قوڵفی پێوەیە هاوسەرەکەیەتی.

*ئەملاو لای دەرگاکە دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کوڕو خزمەتکارو براو

پەناوپشتگیر، ئەڵقەی دەرگا بەڵگەیە لەسەر خاوەنەکەی لەگەڵ خزمەتکارو دەرگاوان.

*ماڵو لانەی نادیار لانەی قیامەتو دواییە چونکە پەروەردگار بەلانەو ماڵ ناوی بردوە ﴿ تلك الدار الآخرة ﴾ (القصص : ٨٣)، هەروەها ئەگەر ناسراوبوو ناوێکی هەبوو وەك لانەی ئاشتی ، ئەگەر یەکێك خۆی دییەوە تێیداو نەخۆشبوو رووی تێدەکات بەپارێزراوی لەفیتنەو ئاشوبەکانی دنیاو خراپەکانی، ئەگەر نەخۆش نەبوو مژدەیە بۆی بەپێی کردارەکانی لە(حەج)و جیهادو دنیانەویستیو بەندایەتیو خێرو چاکەو ئارامگرتن لەسەرپێچیو بەڵگەیە لەسەر ئەو دەرەنجامەی پێیگەیشتوە لەگەڵ ئەوەی لەپێناویدا مژدەی پێدراوە.

*ئەگەر لەخەودا بینی کتێبێکی بەدەستەوەیەو زانستی لێوەردەگرێت زانیارییەکەی هۆکارەبۆی، ئەگەر نوێژی تێدا ئەنجامدەدا بەو نوێژە بەدەستی دەهێنێت، ئەگەر ئەسپو شمشێری لەگەڵدابوو بەجیهادو تێکۆشان پێیدەگات.

*ئەگەر خانوو ماڵێکی جیاواز لەخانوو ماڵی خۆی دروستبکات لەشوێنو جێگەیەکی ناسراو یا نەناسراو تەماشای حاڵو باریدەکرێ ئەگەر نەخۆشبوو یاخود نەخۆشی هەبوو گۆڕەکەیەتی، ئەگەر وانەبوو دنیایەتی سوودی لێوەردەگرێ، ئەگەر لەشوێنو جێگەیەکی ناسراوبوو، ئەگەر بەخشتو قوڕ بینایکرد حەلاڵە، ئەگەر بەخشتی سوورو گەچ بینایکرد حەرامە بەهۆی ئەو ئاگرەوە کەلەئیشوکارەکەی بەردەبێت.

*ئەگەر لانەو ماڵەکەی لەشوێنو جێگەیەکی نادیار دروستکردو نەخۆش نەبوو، ئەگەر بە خشت دروستکرابوو کرداری چاکەیە بۆ قیامەتو دوارۆژی ئەنجامدەدات یاخود کردارێکە ئەنجامیداوە، ئەگەر بەخشتی سووربوو کرداری خراپو نابەجێیە لەقیامەتدا لێی پاشگەز دەبێتەوە مەگەر بیرۆخێنێ تەوبەی لێدەکاتو پاشگەزدەبێتەوە.

*ماڵو لانەی نادیارو چەپەك تەنیا بەتایبەت ئەگەر مردووی تێدابینی لانەی قیامەتە، ئەگە بینی دەچێتە نێوی دەمرێت، ئەگەر لێی نەیەتەدەرەوە، ئەگەر بچێتە نێویو لێی بێتەدەرەوە نزیکدەبێتەوە لەمردنو پاشان قوتاردەبێت.

* ئەگـەر بينـی دەچـێتە نێـو مـاڵو لانەيـەكی نـوێو هەمولايەنـەكانی تـەواوەو لـەنێو ماڵانـدابێت لەشـوێنو جێگەيـەكی ناسـراو، ئەگـەر هـەژاربوو دەوڵەمەنددەبێت، ئەگەر دەوڵەمەندبوو پـتر دەوڵەمەنـددەبێت، ئەگـەر سەرپێـچيكاربوو تەوبـەدەكات بەئەندازەی جوانیو فراوانی.

* ئەگەر ماڵەكە لەقوڕبوو حەڵاڵە، ئەگەر گەچـكاريكرابوو حەرامـەو فراوانـیو گوشـادی مـاڵ فراوانـی دنيـاو دەسـتو دڵفراوانييـە يـان تەنگەبـەری دنيايـە لەگـەڵ بەرچـاوتەنگیو قوڕكاريـشی ئاينەكەيـەتی، بـەلام تۆكمـەو سەقامگيركردنی بـاش ڕێكخستنيەتیو مـاڵو لانـەی ئاسـن درێـژی تەمـەنی خاوەنەكەيـەتی لـەنێو حـاڵو بـاری خۆيدا.

* ئەگـەر لەماڵەكـەی بـەتووڕەيی هاتـە دەرەوە زينـدانی دەكرێـت بـەپێی ئايـەتی: ﴿وَذَا النُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَاضِبًا﴾ (الأنبياء).

* ئەگـەر بينـی چـوە نێـو مـاڵی دراوسـێكەيان ئاگـاداری نهێنيـدەبێت، ئەگەر پياو خـراپ بێت لـەژنو بژێويدا ناپاكیو خيانەتی لێدەكات.

* دروستكردنی ماڵو لانە بۆ كەسێكی رەبـەن ژنێكـی پلەوپايـەدارە دەيكـات بەهاوسەری خۆی ، ئەگەر لانـەو ماڵێـك لەدوورەوە ببينێ مـاڵو داراييـەك دوای ماوەيەكی دووردرێژ بەدەستدەهێنێت، ئەگەر چوە نێویو لەقوڕ دروستكرابوو جيـاواز نـەبوو لـەماڵو گـەڕەك دنيايـە بەدەستيدەهێنێت بەحەلاڵی.

* ئەگـەر بينـی لـەبيناو ماڵێـك دێتـە دەرەوە بـەتووڕەيی يـاخود ڕووی وەردەگێـڕێ دەرچـوونيەتی لـەدنيا يـاخود لـەو حـاڵو بـارەی خاوەنيـەتی بەئەندازەی ئەوەی بەڵگەيە لەسـەریو لێيدێتە دەرەوە.

* دەگێڕنەوە پياوێكی خەڵكی (يەمەن) دێـت بـۆلای ڕاڤـەكارێكی خـەو پێـی دەڵێـت: لەخـەودا بينـيم لەماڵێكـدامو شـتومەكی كـۆنم هەيـە، خانووەكـە ڕووخـا بەسـەرما ، ڕاڤـەكاری خـەويش پێی گوت: ميراتيەكت بۆ دەمێنێتـەوە، زۆری بەسـەرا ڕانـەبورد يـەكێك لەخزمەكانی مردو شەش هەزار درهەمی بۆ بەجێما.

* يـەكێكيتر بينـی لەخـەودا لەسـەربانی ماڵێـك دانيـشتوەو سـەربانەكەی لەشووشەو مەرجان دروستكراوە ، ئنجا بـەڕووتی لەوسـەربانە كەوتـەخوارەوە،

خەوەکـەی بـۆ ڕاڤـەکارێکی خەوگێڕایـەوە، ئـەویش وتـی: ژنێکـی شـۆخو شـەنگی جـوان لـەماڵی فـەرمانڕەواو بەرپرسـێك دەبێـت بەهاوسەرت بەڵام لەناکاو دەمرێت، ئەم لێکدانەوەیەش بۆ خەوبینەر هاتە دی.

* مـاڵو لانـە ژنـی خەوبینـەرەو نەخشونیگاریشی پیـاوە، پەنجـەرەی لانـەو مـاڵی پلـەوپاو ڕێـزداری دنیایـە لەگـەڵ شـکۆمەندیو گەنجیـدا، سەربانەکەی ناوبانگو ناودارییەتی.

* لانـەو مـاڵ بـۆ پێـشەواو ئیمـامی دەبەرەوەر کونجو کەلەبـەرو سـەنگەری موسـوڵمانانە، ڕووخـانی لانـەو مـاڵی فەرمانڕەوای شکۆمەندی کـەمو کـوڕی پلەوپایـەدارە، ئەگـەر پیاوێـك لەسەربانێکی ئادیاربوو بگەر پلەوپایـەو شـکۆمەندیو پـەناگیری لـەپیاوێکی بەناوبانگەوە بەدەستدەهێنێتو داوای کۆمەکیو یارمەتی لێدەکات.

* مەسیحیەکان دەڵێن: ئەگـەر بینـی گسکی ماڵەکەی دەدات غـەمو پـەژارە ڕووی تێـدەکات، یـاخود لـەناکاو دەمرێت، هەروەها گوتراوە گسکی مـاڵ بەسەرچـوونو ڕەواندنـەوەی غـەمو پەژارەیە.

* هەروەها دەڵێن ڕووخانی لانەو خـانوو مەرگی خاوەنەکەیەتی.

(نابلسی) دەڵێت: لانەو خانوو لەخـەودا دنیایە، ئەگەر بینی خانوویەکی قوڕینی نـوێی تـەواوی هەیـە ئەگـەر هـەژاربێت دەوڵەمەنـد دەبێـت، ئەگـەر غـەمو پـەژارەداربێت خوداوەنـد دەرووی لێدەکاتـەوە، ئەگـەر پیـشەوەربێت دەسـتەڵاتو پلەوپایەیـە بەئەنـدازەی باشـی حاڵوبـاری ، ئەگـەر لەسەرپێچیدابوو تەوبەدەکات، ئەگەر لـەقوڕ دروسـتکرابوو باشـی حـاڵو باریـەتی لەقیامەتـدا، ئەگـەر لەخـشتی سوورو گەچ دروستکرابوو خراپی حـاڵو باریەتی لەقیامەتدا، ئەگەر چوەنێویو لێیهاتـە دەرەوە نەخۆشـدەکەوێتو لەمـەرگ نزیکدەبێتـەوە بـەڵام قوتـار دەبێت لێی.

* ماڵو خانوو ئەگەر تـەنیابوو مـردووی تێدا بەدیکرد سەرجەم جێنشینانی ئـەو ماڵە دەمرن.

* ئەگـەر بەتووڕەییـەوە لەماڵەکـەی هاتـەدەرەوە ئاگـاداری نهێنیـدەبێت، ئەگـەر خراپـەکاربوو لـەژنو بژێویـدا ناپاکیو خیانەتی لێدەکات.

* ئەگـەر مـاڵو خانوویـەك دروسـتبکات هەنـدێك لەخزمـە نزیکـەکانی دەمـرن یاخود یەکێك لەکوڕەکانی.

* ئەگەر خانوەکەی بفرۆشێت ژنەکەی تەلاقدەدات.
* ئەگەر ماڵو لانەیەکی خۆشی بینی کرداره چاکەکانییەتی، ئەگەر خانووەکە تەنگەبەرو ناخۆشبوو بەڵگەیە لەسەرکرداری خراپو ناقۆڵا.
* ئەگەر ماڵو خانوویەکی چەپەکبوو ڕێزو شکۆمەندی بۆ دەگەڕێتەوە یاخود ئەوەی لەدەستیداوە بۆیدەگەڕێتەوە.
* دەگونجێت خانوو ماڵ بەڵگەبێت لەسەر چاودێری.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئاڵو گۆڕی شتومەكو ڕۆژگار.
* ئەگەر ماڵو خانوویەك دروستبكات لەخەودا بەشێوەیەکی نادروست شتێکی هەڵچنراو لەحەرام پێکدەهێنێت.
* هەروەهادەڵێن: ڕووخانی ماڵو خانوو مەرگی خاوەنەکەیەتی، ئەگەر بینی ماڵو خانوویەکی نوێ دەڕوخێنێ غەمو پەژارە ڕووی تێدەکات.
* ئەگەر خانوویەکی دروستکردو ڕووخاندی خێرێکی زۆری دەستگیردەبێت، ئەگەر خانوەکەی یاخود ژوورەکانی یا گۆڕەپانو حەوشەکەی یان سەربانەکەی بینی فراوانبوو لەئەندازەی خۆی زیاتر دەروولێکردنەوەیە لەدنیاداو بەخت

چاکییە لەبژێوی‌و ڕزقو ڕۆزیدا، ئەگەر لەنێو خانووەکەدا پیسایی بینی یا بەدەرگاکانەوە پیسییە لەژنەکانیاندا، ئەگەر واییبینی ئەو خانوو ماڵە لەهیچ خانوویەکیتر ناچێتو گڵو خاکەکەی دیارە بریتییە لەموڵکی خەوبینەرو ئەوەی پێوەی دەردەکەوێت.
* ئەگەر نەخۆشێك بینی لەماڵەکەی دێتەدەرەوەو خۆشی بێدەنگەو هیچ لەزاری نایەتە دەرەوە مەرگو تیاچوونیەتی.

**ماڵان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ماڵی پیاو ژنەکەیەتی کەرووی تێدەکات.
دەگونجێت ماڵەکەی بەڵگەبێت لەسەر لەشو لاری‌و ماڵی خزمەتکارانو گەنجینەی گەنمو دایکی کەهۆکاری بژێوییەتی بەشیرو پەروەردەکردنی.
* شوێنی حەوانەوەو پشوودانیش بەڵگەیە لەسەر خزمەتکارو تەیان.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی لەگەڵیایەتی بەتەنیا دەمێنێتەوەو پێداویستی خۆی بەجێدەهێنێت بەدەر لەسەرجەم ئەندامانی خانەوادەکەی.
* تەماشاکردنی پیو لەپەنجەرەی ماڵەکەیەوە بەڵگەیە لەسەر

تەماشاکردنی عەورەتو لەشولاری ژنەکەی.

* ئەگەر لەماڵەکەیدا نەخۆشێك هەبوو بەڵگەیە لەسەر چاکێتی مەگەر سروشتی خۆی وانەبێت.

* ئەگەر نەخۆشینەبوو ژندەهێنێت ئەگەر رەبەنبوو یاخود کچەکەیدەدات بەشوو.

* ئەوەی ببینێ ماڵو خانوویەکی نوێ دەڕوخێنێ خەمو پەژارە رووی تێدەکات.

* ئەوەی ماڵێك دروستبکات یان بیکڕێ خێرێکی زۆر رووی تێدەکات.

* ئەوەی خۆی لەماڵێکی گەچکاریکراوی نوێی نادیاریدا بدۆزێتەوە بەتەنیا لەماڵەکانیتر بەڵگەیە لەسەر شەڕو حاڵی گۆڕەکەی.

* ئەوەی ببینێ خۆی لەماڵێکدا گیرکردووەو دەرگاکانی داخستووەو ماڵەکەی لەناوەڕاستی ماڵانیتردابێت خێرو لەشساغی بەدەستدەهێنێت.

* ئەوەی ببینێ ئارامدەگرێت لەسەر ئەرکو باری ماڵو دیوارێك ئەرکی ژنێك هەڵدەگرێت، ئەگەر ماڵو دیوارەکە هەڵیانگرت ژنێك ئارامدەگرێ لەسەری، دەرگای ماڵ ژنە.

* ئەوەی ببینێ دەرگا دادەخات ژنێکدەهێنێت، دەرگای کراوە دەروازەکانی رزقو رۆزییە، راڕەویش خزمەتکارە لەسەر دەستی ئەو چارەسەری گیروگرفتو کاروباری ئەستەمو گران دەکرێ.

* ئەوەی ببینێ دەچێتە نێو ماڵێك یا دەرگایەك دادەخات لەسەر خۆیو سەرپێچی پەروەردگار ﴿وغلقت الأبواب﴾(یوسف:٢٣).

* ئەگەر بینی بەڵێنیداوە تێیداو دەرگاکانی داخراوەو ماڵەکەش ئاوەلاو فراوانە خێرو لەشساغی بەدەستدەهێنێت.

* ئەگەر بینی ماڵەکەی لەئاڵتوونە دەسووتێ لەوماڵەدا.

* ئەوەی ببینێ لەماڵێکی تەنگ دێتە دەرەوە لەخەمو پەژارە قوتار دەبێت.

* ماڵو لانەی بێسەربان کەخۆر یا مانگ لێوەی دیاربێت ژنێکە لەوماڵەدا شوودەکات.

* ئەوەی لەماڵەکەی خۆیدا لانەیەکی فراوانی قوڕپین ببینێو تێدا نەبووبێ ژنێکی ساڵحە لەو ماڵەدا دەبێت، ئەگەر گەچکاری کرابوو یان بەخشت دروستکرابوو ژنێکی زاڵو دووڕووە،

ئەگــەر لــەژێر ماڵەکــەدا ئــاوەڕۆبوو پیاوێکی فێڵبازە، ئەگەر لەقوڕبوو فێڵ لەئایندادەکات.

* مــاڵو خــانووی تاریــك ژنێکــی بەدڕەوشتی خراپـە، ئەگـەر ژن ببینـێ پیاوە.

* ئەگـەر ببینـێ چـووە مـاڵێکی شـێدار خـەمو پـەژارە لەلایـەن ژنێکـەوە رووی تێدەکات بەئەندازەی تەڕیو شێداریو قــوڕاوی پاشــان بەسەردەچــێتو چاکدەبێت.

* ئەگەر ببینێ ماڵەکەی فراوانترە خێرو فــەڕو بەرەکــەت دەڕژێــت بەســەریاو خێــری دەســتدەکەوێت لەلایــەن ژنێکەوە.

* ئـەوەی ببینـێ ماڵێـك هەڵـدەکوڵێو رەنگاوڕەنگیــدەکات لــەو ماڵــەدا جیـاوازیو ئـاژاوە دەکەوێتـەوە، مـاڵی روناكو ڕۆشنیش بەڵگەیە لەسەر خێرو رەوشتی بەرزی ژن.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی ماڵەکـەی زۆر فــروانترە لــەوەی خــۆی فــەڕو بەرەکـەت دەڕژێـت بەسـەریاو سامانو ماڵی لەلایەن ژنەکەیەوە پێدەگات.

* ئــەوەی ببینــێ مــاڵێکی نــوێ دروستدەکات خەمو پەژارەیەکی گەورە رووی تێدەکات.

* ئەگەر ماڵێکی نوێی بینی دوژمنەکـەی دەمرێت.

* ئەگـەر ماڵەکـەی بـەتاریکی ببینـێ سـەفەرێکی دوور دەکەوێتــە بــەری بێئــەوەی ســوودی لێــوەر بگرێــتو خۆشحاڵ ببێت.

* ئەگەر ماڵەکەی خۆی بەڕۆشنی بـەدی بکات سەفەر دەکاتو خێری دەستگیر دەبێــت، ئەگــەر وایبینــی ماڵەکــەی دەڕوخێــێ مــاڵێکیتر بــەمیراتی وەردەگرێت.

**ماڵئــاوایی( خواحــافیزی ):** (نابلسی) دەڵێـت: ماڵئـاوایی لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر بەسەرچـوونی پلەوپایـە یـان تەڵاقـدانی ژن یـان مردنـی نـەخۆش یاخود چوونە دەرەوە لەنیشتمانێکەوە بۆ نیشتمانێکیتر.

* ئەگـەر بینـی وەك ئـەوەی ماڵئـاوایی لەژنەکەی دەکات تەڵاقیدەدات.

* هـەروەها دەڵـێن: ماڵئـاوایی بەڵگەیـە لەسـەر جیابوونـەوە لـەخواحافیزلێکراو بــەهۆی مــردن یــا هۆکارەکــانیتری جیابوونەوە.

* هـەروەها ماڵئـاوایی بەڵگەیـە لەسـەر جیابوونەوەی هەردوو شەریكو لابردنـی فەرمانڕەواو زەرەری بازرگان.

* هەندێکدەڵێن:ماڵئاوایی لەلێکدانەوەدا باشە، بەڵگەشە لەسەر:

+گەڕانەوەی ژنی تەڵاقدراو.
+چاکبوونەوەی پەیوەندی نێوان دووشەریك.
+سوودو قازانجی بازرگان.
+گەڕانەوەی پلەوپایە بۆ فەرمانڕەوا.
+چاکبوونەوەی نەخۆش.
* هەندێکیتر دەڵێن: ئەگەر مرۆڤ لەخەودا بینی وەك ئەوەی سەلامی ماڵئاوایی بکات خراپە بۆ یەکێك گوێی لێبێتو ئەوەشی دەیڵێت لەبەرئەوەی خەڵکی لەکاتی لەیەك جیابوونەوەدا ماڵئاوایی دەکەن لەیەکتر یاخود نوستنو دەست لەیەکبەردانەدا.
* هەروەها ئەم خەوە بەڵگەیە لەسەر بەتاڵبوونەوەی هاوسەرگیری بۆیەکێك بیەوێت هاوسەربگری و جیابوونەوەی دووشەریكو مردنی کەسێکیش نەخۆشبێت.
**ماڵوسامان:** (نابلسی)دەڵێت: ماڵوسامان بۆ هەژار خراپەیە دێتەڕێی یاخود دەگونجێت زۆرکردنبێت لەدوژمنو کاروکاسبیبێت بۆ حەسوودو رژد.
* دەگونجێت ماڵوسامان بەڵگەبێت لەسەر هاوسەروکرداری چاك بۆ بەدەستهێنانی خۆشیەکانی بەهەشت.
* دەگونجێت ماڵوسامان بۆنەخۆش بەڵگەبێت لەسەر دەوڵەمەندبوون.

**ماڵو منداڵ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵو سامانە بۆیەکێك بەدییان بکات، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ اللهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾ (التوبة: ٢٨).
**مامۆستا:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: مامۆستا بۆ منداڵانی نادیار بەڵگەیە لەسەر میرودادوەرو شارەزا لەگەڵ ئەوەی زوبانی فەرمانکردنو ڕێگری هەیە.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیندانەوان بەهۆی زیندانیکردنی خەڵك.
* هەروەها بەڵگەیە لەسەر راوی چۆلەکە لەگەڵ فرۆشەریدا.
* ئەگەر بینی بوە بەمامۆستا تەماشای حاڵیدەکریو لەگەڵ ئەوەی گونجاوە لەگەڵی وەك پەروەردەکارێك.
* دەگونجێت مامۆستایەکی نادیار بەڵگەبێت لەسەر خوداوەند هەروەك چۆن بەڵگەیە لەسەر دادوەر بەپێی ئایەتی: ﴿الرَّحْمَنُ ، عَلَّمَ الْقُرْآنَ﴾ (الرحمن: ١ـ٢).
**مانگ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەبنەڕەتدا وەزیری فەرمانڕەوایە، مەزنە یان دەستەڵاتدارێکە لەخوار فەرمانڕەواوەو ئەستێرەکانی دەوروبەری سەربازەکانییەتی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانایەکی شارەزاو ئەوەی ڕێنومایی پێوە دەکرێ.
* بەڵگەیە لەسەر:
+کوڕ.
+هاوسەر.
+گەورە.
+کچ بەهۆی جوانییەوە.
* نورو ڕووناکی لەژن و پیاوی جواندەچێ بۆ نموونە دەگوترێ وەك مانگ وایە یاخود کەرتێکی مانگە، پاشان لێکدانەوەی وەك لێکدانەوەی ڕۆژ وایە.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیادوکەم چونکە وەك ماڵ و دارایی و کردار زیادوکەم دەکات.
* ئەگەر نەخۆشێك لەسەرەتای مانگدا بینی هاتەخوارەوە بۆلای لەو نەخۆشی و بەلایە قوتاردەبێ.
* ئەگەر لەکۆتایی مانگدابوو تەمەنی بەسەردەچێ ، دەگونجێت چەند ڕۆژێکی مابێت یان چەن هەفتەو مانگو ساڵێك.
* ئەگەر لەسەرەتای مانگدا هاتەخوارەوە یاخود هەڵهات لەکەسێك ئاوارەو غەریبی هەبوو لەشوێن و جێگەی خۆی دەچێتەدەرەوە لەسەفەرەکەیدا لەنیشتمان دووردەکەوێتەوە.
* ئەگەر مانگی لای خۆی بینی یاخود لەئامێزیدا لەدەستیدا هاوسەردەگرێ بەئەندازەی تیشك و ڕووناکی ژنبێت یاخود پیاو.
* خاتوو(عائشە) (ڕەزای خوای لێبێت) لەخەودا بینی سێ مانگ کەوتەنێو ماڵەکەی، خەوەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە ئەویش وتی: ئەگەر خەونەکەت ڕاستبێ سێ خێرۆمەندی سەر زەوی لەلانەی تۆدا لادەدەن.
* ئەگەر بینی مانگ دیارنەبوو داواکە لەخێروشەڕدایە بەسەردەچێت و دەفەوتێ.
* ئەگەر بینی مانگ هەڵهات لەسەرەتایدایە، ئەگەر مانگی بەدرەوشاوەیی بینی لەئاسماندا وەزیرێك سوود دەگەیەنێ بەخەڵکی ئەو شوێنە.
* ئەگەر تەماشای مانگیکردو هاوچەشنی ڕووخساری تێدا بینی دەمرێ.
* ئەگەر بینی خۆی بەمانگدا هەڵواسی خێری لەدەستەلاتدارەوە دەستدەکەوێ.

* ئەگەر بینی مانگ تاریکبوەو خەوبینەر فەرمانڕەوابوو ژێردەستەکانی ئازاریدەدەنو نکوولی لەفەرمانەکانی تری دەکەن.
* ئەگەر بینی مانگبوە بەخۆرو خەوبینەر خێرو شکۆمەندیو ماڵو سامانی لەلایەن دایك یان ژنەکەی دەستدەکەوێ.
* ئەگەر بینی مانگ تاریکبوەو خەوبینەر فەرمانڕەوابوو ژێردەستەکانی ئازاریدەدەنو نکوولی لەفەرمانەکانیتری دەکەن.
* ئەگەر بینی مانگبوە بەخۆر خەوبینەر خێرو شکۆمەندیو ماڵو سامانی لەلایەن دایك یان ژنەکەی دەستدەکەوێ.
* ئەگەر مانگی بینی هاوتایەتی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەسەفەردایەو کەشتیەوانو ئەستێرەوان بەهۆی تەڕی جموجووڵی.
* دەگێڕنەوە (ئیبن عەباس) (ڕەزای خوای لێبێت) لەخەودا بینی مانگ بەرزبوەوە روو بەئاسمانو خەوەکەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوەو وتی: ئامۆزاکەتە مەبەستی لەخۆیبوو(ﷺ).
* دەگێڕنەوە ژنێکهات بۆ لای (ئیبن سیرین)و نانی نیوەڕۆی دەخوارد، وتی: بینیم لەخەودا مانگ چوو بەنێو کۆمەڵە هەسارەیەکی تۆکمەو رشتەبەنداو یەکێکیش بانگیکرد بچۆ بۆلای (ئیبن سیرین)، ئنجا خەوەکەی بۆ (ئیبن سیرین) گێڕایەوە، ئەویش دەستی لەخواردنەکەی کێشایەوەو وتی: وای لەتۆ چۆن خەوێکی ئاوات بینی؟ دیسان ژنەکە خەوەکەی بۆ گێڕایەوەو رەنگی گۆڕاو دەستی بەسکسییەوەگرتبوو، خوشکەکەی پێی وت: چیتە؟ وتی: ئەم ژنە دەڵێت دوای حەوت رۆژیتر تۆ دەمری .. پاشان لەرۆژی حەوتەمدا مرد.
* پیاوێك لەخەودا بینی تەماشای ئاسمانیدەکرد، دەگەڕا بۆ مانگو نەیدۆزییەوەو ئنجا تەماشای زەویکردو مانگی لەسەرزەوی بینی وردە وردە ونبوو، پاشان خەوەکەی بۆ راڤەکارێك گێڕایەوەو وتی: ئەگەر خاوەنی ئەم خەونە پیاوبوو کیمیاگەرەو ماڵو سامانی لەکیسدەچێت، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەنددەبێت، ئەگەر ژنێك خەڵکی لەو جۆرەی بینی مێردەکەی دەکوژرێ.
* پیاوێك هات بۆلای (ئیبن سیرین)و وتی: لەخەودا بینیم مانگ لەماڵی ئێمەدایە، ئەویش وتی: دەستەڵاتداری باڵا روو لەشارەکەتاندەکات.
* مانگگیران وەك رۆژگیران وایە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا فەرمانڕەوایەکی دادپەوەر یان زانایەکی گەورەیە یا مێردمنداڵێکە یاخود دەستەڵاتدارێکی ستەمکارە یا پیاوێکی درۆزنە.

*ئەگەر مانگی لەژوورەکەی خۆیدا بینی یاخود لای خۆی بینی ژنێك دەهێنێت بەئەندازەی تیشكو رووناکی مانگ،ئەگەر لێڵبوو هاوسەرەکەی هاوتای خۆی نییە.

*ئەگەر ژنێك بینی مانگ کەوتەخوارەوەو کەوتە نێو ماڵی ئەو هەندێکی لێهەڵگرتو لەپارچە پەڕۆیەکی ئاڵاند ئەوە کوڕێکی دەبێت دەمرێو غەمو پەژارە دەخوات بۆی، ئەگەر بینی مانگ تیشكو رووناکی کزبوو وەزیرێك لەکاردەخرێ.

*ئەگەر بینی مانگ بەهاوتای خۆردەچێت بەرێوەو رۆیشتنی باشترە لەرۆیشتنی خۆر وەزیر لەدەستەڵات دەردەچێو یاخیدەبێت.

*ئەگەر مانگی لەماڵی خۆیدا بینی کەسێکی ئاوارەو غەریب دەگەڕێتەوە بۆ لای.

*ئەگەر مانگی لەسەر زەوی بینی مردنی دایکییەتی.

*ئەگەر بەنێومانگدا رۆیی هاوسەرێکی دەوڵەمەندە بۆی.

*رۆژومانگ باوكو دایکن.

*ئەگەر تەماشای مانگیکردو رووخساری خۆی تێدا بەیدکرد دەمرێ.

*ئەگەر ژنێکی دووگیانی هەبوو کوڕێکی دەبێت.

*ئەگەر بینی وابەستەی مانگدەبن خێرو چاکەی لەفەرمانڕەواو دەستەڵاتدار دەستدەکەوێ.

*ئەگەر بینی مانگ تاریکبوو خەوبینەر دەستەڵاتداربوو ژێر دەستەکانی ئازاریدەدەنو نکوولی لێدەکەن.

*مانگ بەڵگەیە لەسەر ژنی خەوبینەر یان دایكو باوکیو خوشك کچیو شتومەكو بازرگانیو کردار.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر کەشتی چونکە دەریاوانان بەدەریادا دەڕۆن بەپێی پلەو رەوتی مانگ.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر سەفەر چونکە هەمیشە جموجوڵدەکات بەڵگەیە لەسەر چاوانی خەوبینەر.

*بینینی مانگ بۆنەخۆش یاخود بۆ یەکێك بەدەریادا تێبپەڕێت بەڵگەیە لەسەر تیاچوونو فەوتان.

*ئەگەر بینی بەری مانگو بەگەواڵەهەورگیرا بەڵگەیە لەسەر

نەخۆشـی تووشـی وەزیـرو کاربەدەسـتدەبێت پاشـان چاکدەبێتەوە.

*ئەگەر مـانگی لـەنێو گەواڵەهـەوردا بینـی لـەکاروباری دەسـتەڵات دووردەخرێتەوە.

*ئەگەر مـانگی بینـی گەواڵـە هـەور دایپۆشیو خۆشی دەوڵەمەندبوو هـەژار دەکەوێ.

*ئەگەر بینـی مـانگ گفتوگـۆ دەکـات لەگـەڵی پلەوپایـەو نزیکـی لەفەرمانڕەوایان بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر ژنێکی دووگیـان بینـی مـانگ لەژوورەکەیدایـە کـوڕی دەبێـت مەگـەر لەخەونەکەیـدا شـتێکی تێـدابێت بەڵگـەبێت لەسـەر کـچ وەك ئـەوەی دەرگای لێدا بخرێ یان بەجلو پۆشاکی دایبپۆشـێ یـاخود لەچـاوی خـەڵکی بەدووری بگرێت.

*ئەگەر مـانگی لەشـوێنێکدا بینـیو دەستی بـۆ درێژدەکات بـەڵام دەستی پێناگـات حـەز لـەکوڕدەکاتو پێـی نادرێ، ئەگەر دووگیانبوو کچیدەبێت.

*ئەگەر بینی مانگ دەرکەوتوە بەپڕیو تەواوی بەڵگەیە لەسـەر لابردنـی وەزیـر چـونکە ئەگـەربوو بـەمانگی چـواردە ڕووناکی تەواو دەبێ پاشان کـەموکوڕی ڕووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی کڕنووشدەبات بـۆ ڕۆژ یا مـانگ گونـاهو تـاوانێکی گـەورە ئەنجامـدەدات یـاخود گوێڕایـەڵی فـەرمانڕەواو وەزیرێکـی دەبێـت لەکارێکی پڕوپووچدا.

*ئەگەر بینی ڕۆژومانگ کڕنووشدەبەن بۆی دایكو باوکی ڕازین لێی.

*ئەگەر مـانگی لـەحاڵی خۆیـدا بینـی لەئاسمانـداو تاریـكو نووتـەکبوو ڕووداوێك ڕوودەکاتە کاربەدەستانی ئەو وڵاتە.

*ئەگەر بینـی مـانگ درزو قڵیشیبردوە دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تیاچوونی وەزیر یان فەرمانڕەوا.

*ئەگـەر مـانگی بینـی چوەتەسـەر شـێوازی پیـاوێکی ملکـەچو ڕسـوا وەزیرێك لەکاردەخرێ.

*ئەگەر مـانگی بینـی تیـشکی هـەبوو دەیویـست بیـشارێتەوە دەردەکـەوێو ئاشکرادەبێ.

*ئەگـەر بینـی مـانگگیراوە یـاخود تاریکارییـەکی هـاتوە بەسـەردا یـان سـووری گـۆڕانو کەموکوڕییـە دەدرێتـەپاڵ ئـەوەی مـانگ بەڵگەیـە لەسەری.

*مانگ بەڵگەیە لەسەر خێرایی سەفەر چونکە بەخێرایی دەڕوات بەنێوگەردووندا.
*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشی بەهۆی سەرماو سۆڵە هەروەك چۆن ڕۆژ بەڵگەیە لەسەر گەرما.
*دەگونجێت مانگ بەڵگەبێت لەسەر حاڵوبار یان کەسێکی هاودەم.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+وەزارەت.
+نووسین.
+دەستەلاتداری ستەمکار.
+قومار.
+سوێند بەپێی ئایەتی: ﴿ كَلاَّ وَالْقَمَرْ (٣٢)﴾ (المدثر)
+چاکبوونەوەو چارەسەر لەنەخۆشیەکانی چاو.
*ئەگەر بینی مانگ درزو قڵیشیبردوە بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی نیشانەیەك بەپێی ئایەتی: : ﴿ اقتربت الساعة وانشق القمر﴾ (القمر:١).
*بینینی مانگ بەشێوەی مانگی چواردە بەڵگەیەکی چاکەو بەپێچەوانەشەوە.
*دەگونجێت مانگ بەڵگەبێت لەسەر شارەزاو زانا بەزانیاری ئەستێرەزانی یاخود ئەوەی شارەزای لێکدانەوەی خەوە.
*ئەگەر مانگی لەشێوەی ڕێزداری خۆیدا بینی بەڵگەی خێرو چاکەیە، بەلام ئەگەر لەشوێنی دابەزینی خۆی بینی بەڵگەی خراپەیە.
*ئەگەر لەبورجی (کاوڕ) بینی دەگونجێت خراپبێت بۆ ئەو ساختمانو بینایانەی هەیە.
*ئەگەر لەبورجی(گا)بینی و خوازیاری سەفەربوو لەپێناوی بەجێهێنانی چاکەدا ئەوە خراپە بۆی.
*ئەگەر لەبورجی(مەڕ)دا بینی خراپە.
*ئەگەر لەبورجی(قرژاڵد)دا بینی بۆ هاوسەرگیری دەشیو دەتوانێت بچێتە لای ژنان.
**ئەگەر لەبورجی (شێر)دا بینی خراپە بۆ شەڕێكو دەستەبەرکردنو تێکەڵی ماڵو دارایی.
*ئەگەر لەبورجی سونبولە(گوڵەگەنم) بینی باشو بەجێیە بۆ بەگەڕخستنی لەشولار.
*ئەگەر لەبورجی تەرازوو (کێشانە) بینی خراپە بۆ خۆیو کەمبوونی ئاو.
*ئەگەر لەبورجی (دوپشك) بینی باشە بۆچێژوەرگرتن لەحەمامو جلوبەرگ بەلام بۆسەفەر خراپە.
*ئەگەر لەبورجی (کەوان)دا بینی خراپە بۆ ڕواندنی دارودرەخت.

*ئەگەر لەبورجی (هەواڵکار)دابینی خراپە بۆ دانانی بناغە.

*ئەگەر لە دۆڵچەدا بینی خراپە بۆ بەگەڕخستنی پەیامبەرو هەموو جموجوولێك.

*ئەگەر لەبورجی (هەنگ)دابینی باشە بۆ گرێبەستی مامەڵە.

*ئەگەر خۆرو مانگو ئەستێرەکانی بینی لەیەك خولگەداو روناکی هەبوو وتەکانی لای فەرمانڕەواو وەزیرو خەڵکی بەڕێز پەسەنددەکرێ، ئەگەر روناکی نەبوو بەڵاو نەهامەتییە بۆ خەوبینەر.

*ئەگەر بینی رۆژو مانگ هەڵهاتن لێی باوكو دایکی رازین لێی، ئەگەر تیشکیان نەبوو تورەوخەشم لەدڵن بۆی.

*ئەگەر رۆژو مانگی لەلای راستو چەپو پشتو قاچەوە بینی غەمو پەژارە یاخود ترسو بیم یان بەڵاو نەهامەتیو هەڵهاتنە بەپێی ئایەتی: ﴿وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ (٩) يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ﴾ (القيامة:١٠).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر خەونەکە لەمانگە ساغەکاندابوو راستەو هەرگیز هەڵەی تێدانییە، بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەرووی خێرو قوتاربوون لەزینداندو چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

*ئەگەر خەوبینەر لەنەتەوەکەی جیابوبوەوە یان لەوڵاتی خۆی دوورکەوتبوەوە دەگەڕێتەوە بۆلایان بەپێی چیرۆکەکەی (یونس)(سەلامی خوای لێبێت).

*دەگونجێت فیتنەو ئاشوبێکی مەزن ببینێ لەمردنی زانایەكو..

*ئەگەر خەوبینەر سەرپێچیکاربوو تەوبەدەکاتو دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا.

*ئەگەر خەوبینەر خوازیاری پلەوپایەبوو لەگەڵ رێزداریدا بەدەستی دەهێنێت چونکەخوداوەند (ئیدریس) پێغەمبەری (ﷺ) بەرزکردەوە.

*ئەگەر خەوبینەر لەسەفەردابوو لەدەریادا هەوا نابێتو دەترسێ غەرق ببێت، پاشان خۆیو ئەوانەی لەگەڵیدایە قوتاردەبن.

*ئەگەر خەوبینەر لەنارەحەتیدابێت قوتاردەبێ لەنارەحەتیو دوژمنەکانی.

*دەگونجێت خەوبینەر لەبیدعەو وێڵیو سەرگەردانی پاشگەزبێتەوە.

*ئەگەر خەوبینەر لەکاروکرداری لابرابوو دەگەڕێتەوە بۆی.
*ئەگەر هەژاربوو یان نەخۆشبوو خوداوەند چاکیدەکاتەوەو دەوڵەمەندیدەکات.
*دەگونجێت خوداوەند وڵاتێکی پێ ئازادبکات و دەستکەوتی زۆری دەستبکەوێت.
*مانگی (سەفەر) باش نییە ئەگەر خەونەکەی تێدابینی بەڵام بینینی خەو تێدا بۆیەکێك لەغەمو پەژارەدابێت هیچی تێدا نییە.
*ئەگەر نەخۆشبوو بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی گوزەران و ئەو حاڵوبارە.
*دەگونجێت خەونەکەی بەڵگەبێت لەسەر دەرووی خێر.
*مانگی (ربیع الاول - رەبیعی یەکەم) ئەگەر خەونی تێدابینی سوودو قازانج لەبازرگانیەکەی دەکات و دەرووی لێدەکرێتەوە.
*ئەگەر مرۆڤ خۆی لە مانگی (رەبیعی یەکەم)دا بینیەوە دەگونجێت کوڕێکی ببێت و باشبێت، ئەگەر خەڵکی لەناڕەحەتیدابن دەڕەوێتەوە، ئەگەر ستەمیان لێکرابێت سەردەکەون و مژدەیان بەکەسێکی دادپەروەر پێدەدرێ و فەرمان بەچاکە دەکات و ڕێگری لەخراپە چونکە لەو مانگەدا پێغەمبەر (ﷺ) لەدایکبوە.
*دەگونجێت خەڵکی غەزایەکی پیرۆز ئەنجامبدەن چونکە لەو مانگەدا غەزای (دومة الجندل) ئەنجام درا.
*ئەگەر خەوەکە لەمانگی (ربیع الاخر، رەبیعی دووەم یادوایی)دابوو خەونەکەی بەڵگەبوو لەسەر خێر هێواش دەبێتەوە، ئەگەر بەڵگەبوو لەسەر شەڕ خێرا ڕوودەدات.
*ئەگەر خۆی لەمانگی (ربیع الاخر)دا بینیەوە بەسەر دوژمنەکانیدا سەردەکەوێت یان کوڕێکی دەبێت زانا بێت یاخود ئازادەبێت چونکە لەومانگەدا ئیمامی (عەلی)(ڕەزای خوای لێبێت) لەدایکبوە.
*ئەگەر خۆی بینیەوە لەمانگی (جمادی الاولی، جەمادی یەکەم) دەرکەوتنی نابێت و حەز لەکڕین و فرۆشتن ناکات، ئەوەی لەخەودا ئەو مانگە ببینێ کچەکەی یان ژنەکەی لەدەستدەدات چونکە لەو مانگەدا خاتوو (فاتمەی زەهرا)(ڕەزای خوای لێبێت) کۆچیکردووە.
*ئەگەر خۆی لەمانگی(رجب)دا بینیەوە بەڵگەیە لەسەر بەرزکردنەوەی

پلەوپایە چونکە لەومانگەدا پێغەمبەر (ﷺ) بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان.

*خەوەکەی لەمانگی (شەعبان)دابوو باشبوو لەشساغ دەبێتو نەشونمادەکاتو خێری زیاددەکات، ئەگەر شەڕو خراپەبوو هێواشدەبێ.

*ئەگەر لەخەودا خۆی لەمانگی (شەعبان)دا دییەوە بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندیو بەرپرس لەبەرنەوەی تێدا هەمووکارێکی دانایی دەرووی لێدەکرێتەوە.

*لەمانگی (رەمەزان)دا دەرگاکانی نارەحەتیو خراپەو رژدی لێدادەخرێو خەونی باشو چاکی تێدا دێتە دی، خەونی خراپو تێکەڵو پێکەڵیش دروست نییە، بەڵام حاڵوباری کەسێکی بێباوەڕ جیایە لەومانگەدا لەچاو موسوڵمانو بێباوەڕ بەتەنیا شەڕو خراپەی بۆ هەیە.

*ئەگەر لەخەودا بینی لەمانگی (رەمەزان)دایە خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر فەڕوخێرو فەرمان بەچاکەکردنو رێگری لەخراپە، ئەگەر خوازیاری زانستو قورئانی مەزنبوو بۆی دێتەجێ چونکە لەومانگەدا قورئانی پیرۆز هاتەخوارەوە، ئەگەر نەخۆشبوو فێی

لەگەڵدابوو چاکدەبێتەوە چونکە تێدا شەیتانەکان کۆتو بەند دەکرێن.

*ئەگەر خەوی بەمانگی (شەوال)ەوە بینیو جەنگی تێدابوو دەستپێدەکات، ئەگەر خۆی لەمانگی (شەوال)دا دییەوە بەڵگەیە لەسەر قوتاربوونی لەنارەحەتیو بەدەستهێنانی خۆشیو شادی چونکە (کابە)ی پیرۆز بیناکراو غەزوەی (خندق)روویدا.

*ئەگەر خەونەکەی لەمانگی (ذي القعدة)داو بینیو خەونەکەی بەڵگەبوو لەسەر سەفەر ئەوا سەفەر ناکاتو باخۆی بپارێزێ، ئەگەر خەونەکەشی بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارە باخۆی بەدووربگرێ.

*ئەگەر خەوی بە(ذي القعدة)ەوە بینی، ئەگەر خەوەکەی بەڵگەبوو لەسەر سەفەر با سەفەر بکاتو بەفراوانی مامەڵەی تێدابکاتو چونکە مانگێکی پیرۆزەو جەژنی قوربانو قوربانی تێدایە.

*ئەگەر لەخەودا بینی لەمانگی (ذي الحجة)دایە یان بینی خەریکە قوربانیدەکات یان نوێژی جەژن دەکات ئەو خەونە بەڵگەیە لەسەر قەرزدانەوەو بەجێهێنانی نەزرو تەوبەو رێنومایی لەدوای سەرگەردانیو وێڵی.

*دەگونجێت خەوەکەی بەڵگەبێت لەسەر لەدەستدانی زانایان و لابردنی کاربەدەستان چونکە لەمانگی (ذي الحجة) (عومەر)ی کوڕی (خەتتاب) (ڕەزای خوای لێبێت) لەگەڵ (عوسمان)ی کوڕی (عەفان) (ڕەزای خوایای لێبێت) مردن

**مانگا**: هەمیشە (ئیبن سیرین) دەیگوت: مانگای قەڵەو بۆخاوەنەکەی باشترە لەهی لەڕولاواز چونکە مانگای قەڵەو سالآنی پڕ فەڕوپیتەو مانگای لاوازیش سالآنی نەبوونی و قات و قرییە بەپێی چیرۆکەکەی (یوسف) (عليه السلام).

*هەروەها دەڵێن: مانگا پلەوپایەو سامانەو مانگای قەڵەویش ژنی خۆشگوزەرانەو هی لاوازیش هەژارە، مانگای شیردەر بەسوودو خێرە، ئەو مانگایانەشی دوو دەفر پڕ شیردەکەن ژنی نارێکە لەگەڵ مێردەکەیدا، ئەوەی ویستی مانگایەك بدۆشیّ و نەیهێشت لێی یاخیدەبێت، ئەگەر بینی یەکێکیتر دەیدۆشیّ و ڕێگەی دەدات و نکوولی لێناکات ئەوەی دەیدۆشیّ ناپاکی لەگەڵدەکات بەنزیکبوونەوە لەژنەکەی.

*ورگی مانگا ماڵ و دارایی بیّ نرخ و کەڵکەو دووگیان بوونی دووگیان بوونی ژنەو ونبوونیشی بەڵگەیە لەسەر تێکچوون و شێوانی ڕەفتاری ژن.

*هەندێکدەڵێن: سپێتی لەرووی مانگادا ناڕەحەتی سەرەتای ساڵەو ماش و برنجیی و بەڵەکی لەلاکانیشیدا ناڕەحەتییە لەناوەڕاستی ساڵداو لەدواوەیدا ناڕەحەتیە لەکۆتایی ساڵدا.

*مانگای پێست داماڵراو بەلاو نەهامەتییە روو لەخزم و کەس وکار دەکات و ونیوە پێست داماڵراویش نەهامەتی و مەینەتیە روو لەخوشك یان کچ دەکات بەپێی ئایەتی: ﴿وان كانت واحدة فلها النصف﴾ (النساء:١١).

*چواریەکی گۆشتی مانگا بەلاو نەهامەتیە روو لەژندەکات، کەمێکیشی بەلاو نەهامەتییە روو لەسەرجەم خزماندەکات.

*هەندێکیتر دەڵێن: خواردنی گۆشتی مانگا بەدەستهێنانی ماڵی حەلاڵە لەساڵدا چونکە مانگا ساڵە.

*هەروەها دەڵێن: دووجار دۆشینی مانگا ساڵی بەفەڕو پیتە، ئەوەی مانگایەکی قەڵەوی کڕی دەستەلاتی ولات و ناوچەیەکی ئاوەدان دەگرێتەدەست ئەگەر شایستەبێت.

*ئەوەی مانگایەکی دەستبکەوێت کێلگەیەکی لەپیاوێکی پیرۆزەوە بەدەستدەکەوێت ئەگەر رەبەنبوو ژنێکی پیرۆزدەهێنێت.

*ئەوەی ببینێ سواری مانگایەکبووە یان هاتوەتە ماڵەکەیو بەستویەتیەوە سامانو خۆشحاڵیو قوتاربوون لەخەمو پەژارە بەدەستدەهێنێت، ئەگەر شانی پێداکرد بەڵگەیە لەسەر زەرەرو زیانو خانەوادەو خزمەکانی دڵنیا نابن.

*ئەگەر بینی جووتبووە لەگەڵی ساڵێکی پڕ فەرو پیت لەلایەکی دیکەوە دێت بەسەریاندا.

*رەنگی مانگاش ئەگەر بدرێتە پاڵ ژنان وەك رەنگی ئەسپ وایە بەهەمان چەشن ئەگەر بدرێتە پاڵ ساڵ.

*ئەگەر لەماڵەکەیدا مانگایەکی بینی شیری گوێرەکەی دەمژی ژنێکە کچەکەی دەبات بەرێوە.

*ئەگەر خزمەتکارێکی بینی مانگایەك دەفرۆشێ هی بەرپرسەکەی ژنی گەورەکەی دەهێنێت.

*ئەوەی ببینێ مانگا یان گایەك بریندارو زامداریکردووە نەخۆشدەکەوێت بەئەندازەی برینداركردنەکەی.

*ئەوەی مانگایەك یان گا بازی بەسەردا بدات نارەحەتیو سزا رووی تێدەکاتو ترسی کوژرانی دەبێت.

*هاتنە نێو شاری مانگای بەدوای یەکدا بەڵگەیە لەسەر بەدوای یەکدا هاتنی ساڵ بەسەر خەڵکیدا، ئەگەر مانگاکان قەڵەوبوون خۆشییە، ئەگەر لاوازبوون نارەحەتییە، ئەگەر جیاوازبوونو ئەوانەی پێشەوە قەڵەوبوون خۆشی پێشدەکەوێت، ئەگەر بەیەکەوە هاتنو جیاوازبوونو ئەو شارەش لەسەر ئاوبوو کەشتی بەپێی ژمارەی مانگاکانو حاڵیان رووی تێدەکەن بەدەر لەوە فیتنەو ئاشوبە وەك رووی مانگا هەروەك دەڵێن: (هەندێکی لەهەندێکی دەچێت)، ئەگەر هەموویان زەردبوون نەخۆشییە روو لەخەڵکیدەکات، خۆئەگەر رەنگیان جیاوازبوو یاخود شاخیان مەترسیداربوو یان هەڵهاتن لێیان یا وەك ئەوەی ئاگر یان دوکەڵ لەدەمو لووتیان دەهاتە دەرەوە سەربازو هێرشە یان دوژمنێکە دەدات بەسەریاندا.

*مانگای دووگیانیش ساڵی ئومێدەوارو پڕ فەرپیتە.

*ئەوەی ببینێ مانگایەك دەدۆشێتو لەشیرەكەی دەخواتەوە دەوڵەمەند دەبێت ئەگەر هەژاربوو پلەوپایەی بەرزدەبێتەوە، بەلاّم ئەگەر دەوڵەمەندبوو دەوڵەمەندیو شكۆدارییەكەی زیاد دەكات.

*ئەوەی گوێرەكەیەكی بچووكی بەدیاری بۆ بهێنن كوڕی دەبێتو، هەموو بچووكێك گەورەكەی لەلێكدانەوەدا ژنو پیاوەو بچووكەكەش منداڵەكەیەتی.

*كوشتنی مانگا ماڵو سامانە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم وەك ئەوەی مانگا یان گایەك سەربڕم ، ئەویش دەڵێت: دەترسم ورگی پیاوێك بدڕی ئەگەر خوێنت بینی هاتە دەرەوە خراپترە چونكە دەترسم بیكوژیت ئەگەر خوێنت نەبینی باشترە.

خاتوو (عائشە) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: لەخەودا بینیم وەك ئەوەی لەسەر بەرزاییەك بموو لەدەوریشم مانگا هەبێتو سەر ببڕێت، (مەسروق) پێی دەڵێت: ئەگەر خەوەكەت وابێت، لەدەوری تۆ كارەساتو ڕووداو ڕوودەدات، ئەمەش ڕوویداو كەوتەوە.

(نابلسی) دەڵێت: مانگا لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سالاّن، مانگای ڕەشو زەرد ساڵێكە خۆشیو فەڕداریی لەخۆگرتووە، پشتی نێوچەوانی مانگا ناڕەحەتیە لەسەرەتای ساڵدا، پاشی مانگاش ناڕەحەتیە لەكۆتاییدا.

*هەروەها دەڵێن: مانگا بەرزیو ماڵی بەرێزەو فەڕوپیتەو بەئەندازەی ئەوەی بەدەستیدەهێنێتو دەیخوات، ئەگەر قەڵەوبوو ژنی بەدینو خواناسە.

*ئەگەر بینی جووتبوو لەگەڵی ساڵێكی پڕ فەڕو پیت لەلایەكی دییەوە دادێت بەسەیا.

*ورگی مانگا ماڵو رزقو ڕۆزییە.

*ئەگەر مانگاكەی بەدووگیانی بینی دووگیانی ژنەكەیەتی، ئەگەر بینی كڕی دەستەلاّتی ناوچەیەكی ئاوەدان بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر مانگایەكی بینی لەماڵی خۆیدا شیری گوێرەكەكەی دەخوارد ژنێك كچەكەی بەخێودەكات، ئەگەر خزمەتكارێكی بینی مانگای گەورەكەی دەدۆشێ ژنی گەورەكەی دەهێنێت.

*ئەوەی ببینێ شیری مانگایەكی بەدیاری بۆ دەهێنن ژنێكی ساڵحو رێزدار بەدەستدەهێنێت یان

دەستەلآت و فەرمانڕەوایی پێدەسپێردرێ.

* ئەوەی ببینێ سواری مانگایەکبوەو مانگاکەی بینیوە دەوڵەمەنددەبێت و لەخەم و پەژارە قوتاردەبێت.

* ئەوەی شاخی گا ببینێ ماڵێکی زۆر بەدەستدەهێنێت و دەبێت بەخاوەنی کارێکی پیرۆزو لەنێوان خەڵکیدا بلآویدەکاتەوە.

* ئەوەی ببینێ لەگا یا مانگایەکدەدات بەدار گوناهی زۆی لەسەر تۆمارکراوە لای پەروەردگار هەروەها ئەگەر بینی گازیان لێدەگرێت.

* ئەوەی ببینێ گایەك دەکەوێت بەسەریا خەوبینەر دەمرێت لەوساڵەدا.

* ئەوەی ببینێ سواری مانگایەکی رەشبووە یان هاتوەتە ماڵەکەی و بیبەستێتەوە خێرو حۆشی رووی تێدەکات و خەم و پەژارەی دەڕەوێتەوە.

* مانگا لەخەودا بەڵگەی خێرە بۆ هەموان، ئەگەر بەکۆمەڵ ببینێ بەڵگەیە لەسەر بشێوی، بەرزکردنەوەی دەنگیش بەڵگەیە لەسەر خەڵکی بێڕەوشت و بەدخوو.

* مانگای پێست گروار بەلآو نەهامەتی خزمانەو مانگای نیوە گرواریش بەلآو نەهامەتی خوشك و کچە.

* ئەوەی رەوگە مانگایەکی نادیار ببینێ و خاوەنی نەبێ بێت و بچێت یان بچێتە شوێنێك یان لێوەی بچێتە دەرەوە ئەگەر رەنگی زەردو سووربێت هیچ جیاوازییەك نییە تێدا نەخۆشیەو لەو شوێنە بلآودەبێتەوە، ئەگەر جیاوازبێت ساڵانە.

* ئەوەی ببینێ بوە بەخاوەن مانگای قەڵەو ساڵێکی بەفەڕو پیتە ئەگەر مانگاکە دووگیانبوو زیاتر.

* ئەوەی ببینێ مانگایەك دەگرێ ساڵەکەی پڕخێردەبێت.

* ئەوەی ببێ بەخاوەن مانگایەك ژنێکی بەدڕەوشت و ئاین دەهێنێت.

* ئەوەی ببینێ مانگایەك دەبات بۆ فەرمانڕەوایەك ناحەزیدەکات لای فەرمانڕەوا دژ بەکۆمەڵێك، ئەگەر فەرمانڕەوا دیاریەکەی وەرگرت بەگوێی دەکات ئەگەر وەرینەگرت بەگوێی ناکات.

* ئەوەی ببینێ گۆشتی مانگا دەخوات یان شیرەکەی ماڵ و دارایی و دەستەلآتی زیاد دەکات و پاکێتی روو

لەئاينيدەكات، ئەگەر نەخۆشبێت پەروەردگار شيفايدەدات.
* ئەوەی ببينێ چەوری مانگا دەخوات فەرووپيتی پێدەگات.
* ئەوەی ببينێ پێستی مانگای بۆ دەهێنن ماڵو دارايی لەفەرمانڕەواو بەرپرسی وەردەگرێت.
* ئەگەر پێستەيان لێسەند غەرامە دكرێت لەلايەن فەرمانڕەواوە.
* ئەوەی پێستە بەدەستبهێنێتو ببێ بەخاوەنی ماڵو داراييەكی لەلايەن دەستەلاتدارەوە دەستدەكەوێت يان لەلای پياوێكی بەڕێزەوە.
* دەگونجێت مانگا بەلگەبێت لەسەر زەوييەكی فرەخێرداروو بەبەرەكەت.
* بينينی مانگاكەی (بنی اسرائيل) فيتنەو ئاشوبە بەهۆی كوشتنەوە بۆئەوەی دەبێت بەخاوەنی يان سياريدانی بەلگەو نيشانەيەك لەوشارەی كەبينويەتی، ئەگەر سەرپێچيكاری دايكی بێت گوێڕايەڵيدەكات.
* ئەوەی ببينێ مانگايەك سەردەبڕیو ترسا لەگۆشتەكەی بخوات ماڵو داراييەكی لەژنێكی شۆخو شەنگەوە دەستدەكەوێت.

**مانگاوگای كێوی:** (نابلسی)دەڵێت: بەلگەيە لەسەر پياوێكی سەركردە بەندايەتی زۆرەو خۆی گۆشەگير كردوە.
* ئەگەر چاوی مانگاو گای كێوی بەديكرد ژنێكی جوانی شۆخو شەنگ بەدەستدەهێنێ.
* ئەگەر سەريبوو بەسەری مانگاو گای كێوی پلەوپايەو دەستكەوتو سەرۆكايەتی بەسەر خەڵكی غەريبو ئاوارەدا بەدەستدەهێنێ.

**مانگی نوێ:** (ئيبن سيرين)دەڵێت: بەلگەيە لەسەر پادشاو زيندانیو سەربازو لەدايكبوويەكی ديار لەرەحمدا كەراستەوخۆ دوای لەدايكبوون دەگریو هاواردەكات، هەروەها بەلگەيە لەسەر خێرێكی كتوپڕو سەركەوتن لەولايەوە مانگی تياهەڵدێ.
* هەروەها بەلگەيە لەسەر شۆڕشگێڕو ياخی ئەگەر لەشوێنی خۆيەوە هەڵهات ياخود تاريكايی لەگەڵدابوو يان بارانی خوێناوی ياخود لەبەر ڕۆينی جۆگەو ئاوە، يا گەڕانەوەی ئاوارە يان چوونەسەر منارە لەلايەن بانگبێژەوە، يا چوونەسەر دوانگەی وتاربێژو كەسێكی هەڵواسراوی ڕێزدار.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تەواوكردنی ئەجەل و فەرمانكردن بەقەرزدانەوە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر (حەج) بۆ یەكێك لەمانگەكانی (حەج)دا بیبینێ یان لەو ڕۆژانەدا.

* ئەگەر بینی مانگ لەڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا هەڵدێ و خەڵكی تەماشایدەكات نەوەك یەكەم و كۆتا شەوبێت لەومانگەدا خێر روودەكاتە خەڵكی بەكارێكی ناسراو.

* ئەگەر تیشك و روناكیبوو خەڵكی ستایشی خوایاندەكرد كارێكی باشە.

* ئەگەر تاریكبوو دورستكراوێكبوو لەزەردو لەشێوەی مارو دووپشكدا دەركەوت هیچ خێرێكی تیانییە، ئەگەر گەورەیی زیادیكرد یان بەئاسماندا ڕۆیی بەردەوام دەبێت و بڵاودەبێتەوە ، ئەگەر ڕۆیی و بڵاوبووەوە پاشان نەماو لەچاو ونبوو بەڵگەیە لەسەری نامێنێت و بەتاڵ و پووچ دەبێتەوە، ئەگەر بەڵگەبوو لەسەر شۆڕشگێڕ بەڵگەیە لەسەر تیاچوون و نەمانی، ئەگەر هەر خۆی بینی لەماڵەكەیدا بەدەر لەخەڵكی مزگەوت یان بینی هاتەخوارەوە یان گیراو دیارنەما یاخود كەوتەنێو ژوورەكەی كەسێكی ئاوارەی دەگەڕێتەوە ئەگەر سەرەتای مانگبوو، وەگەرنا نارەحەتییەكانی دووردەكەونەوەو سەفەرەكەی دووردەكەوێتەوە.

* هەندێكدەڵێن: ئەگەر مانگی چواردەی بینی كوڕێكی پیرۆزیدەبێت یاخود پۆست و دەستەڵاتێكی پیرۆز وەردەگرێ ، ئەگەر بازرگانبوو سوودو قازانجدەكات لەبازرگانیەكەیداو مانگی جەمبوو (جەج)ە بەپێی ئایەتی: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَهِلَّةِ﴾ (البقرة:١٨٩).

* ئەگەر بینی مانگ سووربوە ژنەكەی منداڵی لەباردەچێت ، ئەگەر بینی كەوتوە بەسەر زەویدا زانایەك یان كوڕەكەی تیادەچێت.

* ئەگەر بینی خەڵك بەدوای مانگدا دەگەڕێت و نایدۆزێتەوەو كەسیش نایبینێ دەمرێ.

* هەندێكدەڵێن: ئەگەر بینی مانگی بینی سەردەكەوێت بەسەر دوژمنەكانیداو زاڵدەبێت بەسەریاندا.

* ئەگەر بینی مانگ بەدەركەوت لەڕۆژانی دووەم و بەرەو ژووریدا دەركەوتنی فەرمانڕەوایان لەدایكبوونێكی مەزنە ، یان گەڕانەوەی ئاوارەیە یان كارێكی نوێیە، هەڵهاتنی مانگ پیاوێكی ڕێزدارە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ئەگەر لەشوێنی خۆی هەڵهات کوڕێکی ڕێزدارە بۆ یەکێك بەدەستەڵاتداری بزانی دەستەڵات یان بۆ بازرگان سوودو قازانجە.

* ئەگەر کۆمەڵێ مانگی بەیەکەوەبوی دی (حەج)دەکات بەپێی ئایەتی:﴿یسألونك عن الأهلة﴾ (البقرة:١٨٩).

* دەرکەوتنی مانگ بەڵگەیە لەسەر ڕاستی بەڵێن یان گرتنی ماڵو سامان چونکە کڕێی گرتنو قەرزی تێدەکەوێتو دەرکەوتنی لەشوێنێکەوە هی خۆی نەبێ وەك ڕۆژهەڵات کارێکی خراپە.

* ئەگەر بەخێرایی ئاوابوو لەو شوێنانەوە خراپەیە بەردەوام نابێت.

* بینینی مانگ سەرکەوتنە بەسەر دوژمنانداو دەڵێن: بەجێهێنانی بەڵێنو پەیمانە.

* دەگونجێت بینینی مانگ بەڵگەبێت لەسەر تەوبەی سەرپێچیکارو موسوڵمانبوونی بێباوەڕو قوتاربوون لەناڕەحەتی وەك زیندان یان چاکبوونەوەی نەخۆش.

* بینینی مانگ لەسەرەتاوە باشترە لەکەمبوونی.

* ئەگەر مانگێکی بینی دەرکەوت پاشان دیارنەما ئەو کارەی داواخوازیەتی بەجێنایەت.

**مانەوە:** (نابلسی) دەڵێت: مانەوە لەخەودا بۆ ئەوانەی پەیمانیانداوە ماڵو لانەیە یا بۆ مرۆڤ جێگیربوونیەتی لەسەرئەوەی لەسەریبووە بەکاروپیشە.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر یەکتاپەرستی ئەگەر یادی خوایکرد، ئەگەر لەخۆیداو دەموچاوی بریندارکرد بەڵگەیە لەسەر خاوەنەکەی.

**ماوەی دووردرێژی ـ ساختمانی بەرزو چەند نهۆم:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ماوەیەکی دووردرێژ دەبڕێ یان ساختمانێکی کڕی یاخود پێی بەخشرا ئەوە سەفەرێکی دوور دەکەوێتە بەری بەپێی ئایەتی: ﴿وَلَكِنْ بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ﴾ (التوبة: ٤٢).

* ئەگەر بینی ماوەیەکی دوورنزیکدەکاتەوە یاخود ساختمانێك هەڵدەچنێ یان پەرتو بڵاویدەکاتەوە سەفەر دەکات.

**ماین:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ماین بەڵگەیە لەسەر هاوسەر، ئەگەر لەسەر پشتی ماینەکە دابەزیو نەیتوانی سواری بێت یان لغاوەکەی لێکردەوە یاخود بەرەڵایکرد ژنەکەی تەڵاقدەدات.

*ئەگەر ویستی گەڕانەوەی شاردەوە یـاخود بەهۆیەکـەوە دابـەزی هاوسـەرەکەی لـەخولی مانگانـەدابێت‌و خـۆی لێدوورخستەوە، ئەگـەر دابـەزی لەسەری بۆسواری ئەسپێکی تربوو ژن بەسـەریدەهێنێت، ئەگـەر لـەکاتی سـورابوونیدا رووی وەرگێـڕا بـەپیادە سـەفەردەکات، ئەگـەر کـاتێ دابـەزی لەسـەری میزیکـرد بەسـەر زەویـداو میزەکـەی خوێنبـوو بـەهۆی زینـاوە لەهاوسـەرەکەی بێئاگادەبێـت چـونکە زەوی ژنەو میزکردنیش هاوسەرگیرییەو خوێنیش حەرام‌و یاساغکراوە.

*هەروەها بەڵگەیەلەسەر ماڵ‌ودارایی.

*مـاینی رەش: ژنێکـی ئاینـداری دەوڵەمەندو بەناوبانگە.

*ماینی بەڵەك بەڵەك: بـەجوانی‌و مـاڵ‌و دارایی بەناوبانگە.

*ماینی زەرد: ژنی خۆشحاڵ‌و چوست‌و چالاکە.

*مـاینی سـپی: ژنێکـی خوانـاس‌و دیندارە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی بەبێ زین‌و لغاو سواری ماینبوە بەبێنـەوەی خـۆی لەگوناهو تاوان بپارێزێت ژنێکدەهێنێت یاخود دەکـەوێت بەسـەر کارێکدا بـۆی ناچێتەسەر.

## م ر

**مراوی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئـەوەی ببینـێ گۆشتی مـراوی دەخـوات مـاڵ‌و دارایـی پێـدەگات لەگـەڵ ژنێکـی دەوڵەمەنـد چـونکە قـاز لانکـەی ئـاوەو بێزار نابێت لێی.

*هـەروەها دەڵـێن: مـراوی پیـاوی مەترسـیدارە خـاوەن وەرەع‌و خواناسی‌وپاکیە، ئـەوەی قـاز لەگـەڵی بدوێت رێزو پلەوپایەی لەلایەن ژنێکەوە پێدەبەخشرێ.

(نابلسی) دەڵێـت: مـراوی لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر ژن‌و کـچ ، هـەروەها بەردەست‌و خزمەتکاری فەرمانڕەوایە، دەگونجێت ژینی خۆشنوودبێت بـەهۆی خۆشـی‌و بـەتامی گۆشـتەکەوە یـا بەڵگـەبێت لەسـەر کەشتیەوان‌و لانـەی نوێووێران.

*ئـەوەی لەخـەودا دەنگـی مـراوی ببیـستێ لەماڵەکـەی یـاخود ولات‌و شـوێنی جێنـشینی دەنگـی بـەلاو نەهامەتیە لەو شوێنە روودەدات یاخود تیاچوون‌و فەوتانە.

**مردن (مـەرگ):** (ئـیبن سـیرین)دەڵێـت: (عەبدولعـەزیز)ی کـوڕی (سـولەیمان)م بینـی لەخـەودا جل‌وبـەرگێکی سـەوزی لەبـەردابوو، تـاج‌و سـەوڵەدانێکیش

بەسەریەوەبوو کەلە گەوهەر دروستکرابوو ، وتم: ئەی باوکی (محەمەد) دوای مردن چۆنبووی؟ یاخود تامو چێژی مردن چۆنبوو یا کاروبارەکان لەوێ بەچ شێوەیەکبوون؟ وتی: سەبارەت بە مردن ئێجگار ناخۆشو غەمهێنە بەڵام سۆزو بەزەیی خوایی هات بەسەرماندا و کەمو کوڕییەکانی داپۆشینو ئەمەشمان بەفەزڵو چاکەی خودا بەدەستهێنا.

*(ئەبو سەعد) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: مردن لەخەودا پەشیمانبوونەوەیە لەکارێکی مەزن، ئەگەربینی مردو پاشان زیندوبوەوە گوناهێك ئەنجامدەدات پاشان پاشگەز دەبێتەوەو تەوبەدەکات بەپێی ئایەتی: ﴿ربنا امتنا اثنتين واحييتنا اثنتين فاعترفنا بذنوبنا ﴾(غافر:١١).

*ئەگەر بینی بەبێ نەخۆشیو شێوەی ئەوەی دەمرێ مرد تەمەندرێژدەبێت.

*ئەگەربینی نامرێ ئەجەلو وادەی ڕۆیشتنی نزیکبوەتەوە.

*ئەگەر خەوبینەر بینی هەرگیز نامرێت لەپێناوی خودایا دەمرێ.

*ئەگەربینی مردو پرسەی بۆدانرا دوای ئەوەی شتیانو کفنکرا دنیای باشدەبێو قیامەتی خراپ.

*ئەگەربینی پێشەوایەك مرد شارەکەی خراپدەبێت هەروەك چۆن وێرانبوونی شار بەڵگەیە لەسەر مردنی ئیمامو پێشەوا.

*ئەگەر مردوویەکی ناسراوی بینی جارێکیتر مردەوەو گریان بەسەریا بەبێهاوارو لاواندنەوە کەسێکی وەچەی ئەو مردوە هاوسەردەگرێو گریان شێوەنەکە بەڵگەو دەرووی خێرە بۆیان.

*هەروەها گوتراوە: ئەگەر مردوویەکی بینی سەرلەنوێ مردەوە مردنی کەسێکی جێنشینیەتی.

*ئەگەربینی مردوەو شێوەی مردووی نەبینی لەگەڵ کفندا لەماڵەکەیدا دیوارو جێگەیەك دەڕوخێ، ئەگەر خەونەکە لەسەر حاڵوباری خۆییوو نەگریانو نەناشتنی تەرمی تێدانەبوو بینای ئەوەی ڕوەخاوە دروست ناکرێتەوە، مەگەر بکەوێتە دەستی کەسێکیترەوە.

*ئەگەربینی مردنێکی خراپو دڵتەزێن لەشوێنێکدا کەوتەوە بەڵگەیە لەسەر کەوتنەوەی ئاگر لەوشوێنەدا.

*ئەگەر بینی مردوەو بەرووتی لەسەر زەوی دانراوە هەژاردەکەوێت.

*ئەگەر خۆی لەسەر ڕاخەرێك دییەوە دنیا دەروازەکانی بۆ ئاوەلادەکات

ئەگەر خۆی لەسەر رەختی خەوێك بینی پلەوپایەی بەرز بەدەستدەهێنێ یاخود لەخانەوادەکەیەوە خێری دەستگیردەبێ.

*ئەگەر مردوویەکی دۆزییەوە ماڵوسامان دەدۆزێتەوە.

*ئەگەر هەواڵی مەرگی کەسێکی ئاوارەی پێگەیشت غەمو پەژارەیەکی کتوپڕ رووی تێدەکاتو دەگونجێت بەو غەمەوە بمرێ.

*ئەگەر دووگیانێکی بینی مردوەو خەڵکی دەستیانکردوە بەشیوەنو گریان بەبێدەنگو لاواندنەوە کوڕێکی دەبێتو پێی شادو دڵخۆشدەبێ.

*هەندێکدەڵێن: بینینی مردن لەلایەن کەسی رەبەنەوە بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری ، مردنی هاوسەردار بەڵگەیە لەسەر تەلاقدانی چونکە بەهۆی مردنەوە جیاوازیو ئاژاوە دەکەوێتەوە، بەهەمان شێوە ئەگەر یەکێك لەو دوو شەریکە مەرگی ئەوی دیکەی بینی بەڵگەی جیابوونەوەیانە.

*ئەگەربینی دەستەلاتدارێك مردوەو دەگرین بەدووی تەرمەکەیدا بەبێهاوارکردن لەو فەرمانڕەوایە خۆشیو شادی بەدیدەکەن.

*ئەگەربینی فەرمانڕەوای وڵات مردو خەڵکی باسی چاکەکانیدەکەن لەدەستەلاتەکەیدا باشدەبێ.

*ئەگەر خۆی لەنێو کۆمەڵێ مردوودا بینیەوە لەنێو کۆمەڵێ دووڕوودا بەدفەرمانیان پێدەکات بەچاکەو بەگوێی ناکەن خوداوەند دەفەرموێ: ﴿فانك لاتسمع الموتى﴾(الروم:٥٢).

*ئەگەربینی بەمردوویی لەگەڵیان مایەوە لەسەر بیدعە دەمرێ یاخود سەفەرێك دەکاتو لێی ناگەڕێتەوە.

*ئەگەربینی تێکەڵیانبوو یاخود دەستی بەریانکەوت خراپەی لەلایەن خەڵکی سووکەوە پێدەکات.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەربینی هاوەڵایەتی مردوویەك دەکات سەفەرێکی دوور دێتەبەری‌و خێرێکی گەورەی لێبەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر مردووی لەسەرشان هەڵگرت ماڵو سامانی گەورەی دەستگیردەبێت، ئەگەر مردووەکە نانیخواردو تەمەنی درێژدەبێت.

*بینینی مەرگی فەرمانڕەوا بەڵگەی لابردنیەتی.

*مەستی مردوو خێری تێدا نییە.

*ئەگەر مردوویەکی بینی خۆی دەشوات بەڵگەیە لەسەر قوتاربوونی

شـوێنکەوتەکانی لەغـەمو پـەژارەو زیـادبوونی مـاڵو سـامانیان ، ئەگـەر مرۆڤێـك شـتی تەوبـەدەکات لەسـەر دەسـتی ئـەو مرۆڤـەداو کەسـێکی خراپەکارو تێکدەر.

*مردوشـۆر بازرگـانێکی بەسـوودە بـەهۆی کۆمەڵێکـەوە لەغـەمو پـەژارە قوتاردەبێـت یـاخود پیـاوێکی بـەڕێز لەسەر دەستی ئەو تەوبە دەکات یاخود کۆمەڵێکی خراپەکار.

*ئەگـەرخۆی لـەژووری مردووشـۆردا بینییەوە لەغەمو پەژارە قوتاردەبێتو سوود دەگەیەنێ.

*ئەگـەر مردوویـەکی بینـی بـەدوای کەسـێکدا دەگـەڕێ جلوبەرگەکـەی بشوات ئاتاجییەتی بۆ دوعاو خێـر یـان قەرزدانـەوە یـاخود گـەردن ئـازادیی نەیارەکـەی یـاخود بـەجێهێنانی وەسیەتە.

*ئەگـەربینی کەسـێك جلـەکانی شـت خێرێکـە دەگـات بەمردوەکـە لەجلشۆرەوە.

*ئەگـەر کۆمـەڵێکی نادیـاری بینـی رازاندییـەوەو جلوبـەرگی رازاوەیانکردەبـەری بـەبێ هـۆ وەك جەژنو شـایی هەیـە بەتـەنیا لەماڵێکدا بەجێیانهێـشت بەڵگـەی مردنیـەتیو جلوبـەرگی سـپیش دیـاریکردنی کاروبارەکانیەتی.

*کافورو بۆنیخۆش بەڵگەی تەوبەیە بۆ خراپەکارو دەرووی خێرە لەبۆ غەمبارو ئەوەی شایستەی چاکەیە.

*ئەگـەربینی پـەنادەگرێ بـەپیاوێك بۆنیخۆشی بۆ بکڕێت بۆ کارێکی باش پەنای بۆ دەبات لەبەرئـەوەی کافورو بۆنیخـۆش بۆگـەنی مـردوو دەرەوێنێتەوە.

*ئەگـەربینی لەسـەر دارەمـەیتێك هەڵـدەگیرێ باسوخواسـی بـەرز دەبێتەوەو ناوبانگدەردەکات.

*ئەگەربینی لەسەر تەرمێکە برایـەتیو تەبایی لەبەرخوا دەبەستێ، خوداوەند دەفـەرموێ: ﴿اخْوَانـاً عَلَـى سُـرُرٍ مُتَقَابِلِينَ﴾ (الحجر:٤٧).

*ئەگـەر مردوویـەکی بینـی وابەسـتەی خراپـەکارێکبوو مـشك راودەکـات، ئەگەربینی مردوویەکی گواسـتەوە بـۆ گۆڕستان پێداویستیو سوودو قازانجو خێر لەبازرگانیەکەی دەکات.

*نوێـژکردن لەسـەر مـردوو زۆر دوعاکردنو داوای لێخۆشبوونە بۆی.

*ئەگەر پێشەوای لـەکاتی نوێـژدا بینـی نوێـژی لەسـەردەکرد دەسـتەڵاتو پۆسـتێك لەلایـەن فەرمانڕەوایـەکی دووڕووەوە وەردەگرێت.

*ئەگەر خۆی لەدوای پێشەوایەکەوە بینی نوێژدەکات لەسەر مردوویەك ئامادەی کۆڕێکدەبێت تێیدا دوعا بۆ مردوو دەکرێ.

*ئەگەر مردوویەکی بینی بەزیندوویی کاروباری چاکدەبێت دوای ناڕەحەتیو لەلایەکەوە دەرووی لێدەکرێتەوە خۆی خوازیاری نەبوە.

*ئەگەر زیندوویەکی بینی مردبوو کاروباری لێقورسوگراندەبێت چونکە ژیان ئاسانەو مردن قورسو گرانە.

*ئەگەر مردوانی بینی مژدە دەدەن بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵی لەلای خودا چونکە ئەوان لەلانەی حەقو راستین، ئەگەر بەدیکردن بەحاڵێکیترەوە یان پشتیانهەڵکرد بەڵگەیە لەسەر خراپی حاڵوباری لەلای خودا بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ): "بەسە یەکێکیان لەخەودا ئامۆژگاری بکرێ".

*ئەگەر مردوویەکی بینیو ناسیو پێی راگەیاند نەمردوە بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵی مردوو لەقیامەتدا بەپێی ئایەتی: ﴿بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾(ال عمران: ١٦٩) بەهەمان شێوە ئەگەر تاجو سەوڵەدانی بەسەر مردوەوە بینی یاخود ئەموستیلە یان بەدانیشتوویی بینی لەسەر جێگەیەك.

*ئەگەر جلوبەرگی سەوزی بەسەر مردوویەکەوە بینی مردنەکەی لەسەر شێوەیەك لەشێوەکانی شەهیدبوە، هەروەك چۆن ئەو خەونە بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵی مردوو لەقیامەتداو باشی حاڵیەتی لەدنیاشدا.

*ئەگەر مردوویەکی بینی بزەو خەندە لەسەر لێوەکانیبوو لێیخۆشبوون بەپێی ئایەتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ، ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ﴾ (عبس:٣٩).

*ئەگەر مردوویەکی بەروویەکی گەشەوە بینی نەدوا لەگەڵیو دەستی تێوەنەدا رازییە لێی بەهۆی گەیشتنی چاکەی پێی دوای مردنی.

*ئەگەر بینی پشتی تێکردوە وەك ئەوەی پێیدەدات بەڵگەیە لەسەرنەوەی گوناهو تاوانێکی ئەنجامداوە.

*ئەگەر مردوویەکی بینی لێدا قەرزدەداتەوە.

*ئەگەر مردوویەکی بەدەوڵەمەندی بینی پتر لەحاڵی پێشوویو ژیانی چاکەی حاڵوباریەتی لەقیامەتدا.

*ئەگەر هەژارێك خەوی لەو چەشنەی بینی هەژارێتی بەچاکە بۆ دەنووسرێ.

*ئەگەر مردوویەکی بینی رووتبوو دەرچوونیەتی بەبێخێر لەدنیادا.

*هەروەها گوتراوە: رووتی مردوو پشوودانیەتی ، ئەگەر بینی کۆمەڵێکی ناسراو لەیەك شوێندا جلوبەرگیان لەبەرکردوە دڵخۆشن حاڵوباریان باشدەبێ.

*ئەگەر غەمباربوو یان جلو بەرگیان پیسبوو هەژاردەکەون و گوناهو تاوان ئەنجامدەدەن.

*ئەگەر خۆی لەگۆڕستانێکی ناسراو بینی وەك مردوو خەڵکی ئەو شوێنە ناڕەحەتی روویان تێدەکات و دووڕوو لەنێویاندا سەر هەڵدەدات.

*بێباوەڕی مردوو ئەگەر لەحاڵێکی باشدا بینرا بەڵگەیە لەسەر بەرزبوونەوەی کاروباری و باش نییە حاڵی لای خودا.

*ئەگەربینی مردوویەك پێکەنی ئنجا گریا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەموسوڵمانی مردوە، هەروەها ئەگەر رووخساری مردوو رەشداگیرساوە بەپێی ئایەتی: ﴿فأمَّا الذينَ اسوَدَّتْ وُجُوهُهم اكفَرتُم بعْدَ ايمَانِكُم﴾ (ال عمران: ١٠٦).

*ئەگەر جلوبەرگی چڵکنی بەمردووەوە بینی یاخود وەك نەخۆش وابوو بەرپرسە لەنێوان و خۆی و خودا لەئاینەکەی.

*ئەگەر مردوویەکی بینی سەرقاڵە یاخود شوێنکەوتەی کاری خۆیەتی.

*ئەگەربینی باپیرەو داپیرەی زیندوبوونەتەوە ژینی باپیرەو داپیرەیەتی لەگەڵ پشك و بەشیان .

*ئەگەر بینی دایکی زیندوبوەتەوە دەرووی لێدەکرێتەوە لەغەم و پەژارەیەك کەوا رووی تێکردووە، بەهەمان شێوە ئەگەر باوکی بینی بەڵام لەلێکدانەوەدا بینینی باوك بەهێزترە.

*ئەگەربینی کوڕێکی زیندوبوەتەوە دوژمنێکی لەلایەکەوە دەردەکەوێت کەواهیچ چاوەڕێنەبوە، ئەگەر بینی کچێکی مردووی زیندوبوەتەوە دەرووی لێدەکرێتەوە.

*ئەگەربینی برایەکی مردووی زیندوبوەتەوە بەهێز دەبێت دوای لاوازی، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿اشْدُد بِهِ أَزْرِي﴾(طه:٣١).

*ئەگەر خوشکێکی مردووی بینی زیندوبوبوەوە کەسێکی ئاوارەی لەسەفەر دەگەڕێتەوەو خۆشی رووی تێدەکات بەپێی ئایەتی: ﴿وَقَالَتْ لأخْتِهِ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِ عَنْ جُنُبٍ وَهُمْ لاَيَشْعُرُونَ﴾ (القصص:١١).

*ئەگەر خاڵی یا پووری بینی ژیانەوە شتێکی بۆ دەگەڕێتەوە لەدەستیدەرچوە.

*ئەگەربینی مردوویەکی زیندووکردوەتەوە لەسەر دەستی ئەودا بێباوەڕێك موسوڵماندەبێت یاخود خراپەکارێك تەوبەدەکات.

*ئەگەر لەگەڕەکەکەی خۆیاندا ژنی مردووی ناسراوی بینی لەماڵو لانەی ئەودا بەزیندوێتی وەستاونو خۆیان رازاندوەتەوە، بۆ ئەو ژنە مردووانە کرداری جوانو رەفتاری شیرین زیندودەکاتەوە بەئەندازەی جوانی خۆیانو جلوبەرگەکەیان، ئەگەر جلەکانیان سپیبوو کاروباری ئاینە، ئەگەر سووربوو کاروباری حەزو ئارەزوە، ئەگەر رەشبوو دەوڵەمەندیو شکۆمەندییە، ئەگەر پروکابوو جلەکان هەژاریو غەمو پەژارەیە، گەرپیسو چڵکنبوو بەڵگەیە لەسەر ئەنجامدانی گوناهو تاوان.

*ئەگەر مردوویەکی بینی نوستبوو خەونەکەی پشوودانیەتی لەقیامەتدا.

*ئەگەربینی لەجێگەیەکدا نوستوە لەگەڵ مردوویەکدا تەمەنی درێژدەبێت.

*ئەگەر مردوویەکی بینی نوێژدەکات لەشوێنێك گەواهی نوێژکردنی خۆینەربوو، لەرۆژانی ژیانیدا لێکدانەوەی بەچەشنێکە ئەجرو پاداشتی کردارەکانی دنیای پێگەیشتوە، ئەگەر مردوەکە فەرمانڕەوابوو جێنشینەکانی هەمان ئەجری ئەو بەدەستدەهێنن.

*ئەگەربینی مردوەکە لەشوێنێکدایە کەرۆژانی ژیانی دنیای نوێژی تێداکردوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر چاکی ئاینەکەی مردوو دوای خۆی، چونکە مردوو زنجیرەی کردارەکانی بۆ خۆی پچڕاوە.

*ئەگەربینی مردوویەك بەرنوێژی بۆ زیندواندەکات تەمەنی ئەوانە کورتدەبێ چونکە دوای مردووکەوتوون.

*ئەگەربینی دوای مردووکەوتوەو شوێنەواری هەڵگرتوە لەچوونە نێوو هاتنەدەرەوەیدا ئەوجا وابەستەی کرداری چاکو خراپیدەبێت.

*ئەگەر مردوویەکی لەمزگەوتێکدا بینی بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی لەسزا چونکە مزگەوت دڵنیاییە.

*ئەگەر مردوویەکی بینی هاواری ئێشوئازاری سەریکرد بەرپرسە لەکاروبارێکدا بەرانبەر دایكو گەورەکەی. ئەگەر هاواری ئێشوئازاری گەردنیکرد بەرپرسە لەتیابردنی

ماڵوساماني ياخود ريگري پيداني مارەيي ژنەكەيەتي.

*ئەگەر ئازاري دەستي هەبوو بەرپرسە لەبراكەيو خوشكەكەيو شەريكەكەي يان سوێندێك كەخواردوويەتي بەدرۆ.

*ئەگەر ئازاري كەلەكەي هەبوو بەرپرسە لەمافي ژن.

*ئەگەر ئازاري سكي هەبوو بەرپرسە لەمافي باوكو خزمەنزيكەكانيو ماڵو ساماني.

*ئەگەر ئازاري قاچي هەبوو بەرپرسە لەخەرجكردني ماڵەكەي لەرێگەيەكي بەدەر لەرەزامەندي خودا.

*ئەگەر ئازاري رانو لاقەكاني هەبوو ژياني لەناحەقيو ئارەزوو شتي پووچو بەتاڵدا بەسەردەبات.

*ئەگەربيني مردوويەك بانگيكرد لەلايەكەوە نەيدەبيني ئەويش وەڵاميدايەوەو چوە دەرەوە لەگەڵي نەيتواني رێگريي لێي بەهەمان نەخۆشي ئەو مردوە دەمرێت كەبانگيكردوە ياخود بەهەمان هۆكاري مردني لەرووخانو نوقمبوونو مەرگي كتوپڕ تيادەچێت.

*بەهەمان شێوە ئەگەربيني دواي مردوويەك كەوتوە لەگەڵي چوە نێو لانەو ماڵێكي ناديار پاشان نەهاتە دەرەوە دەمرێ.

*ئەگەربيني مردوويەك پێي گوت: لەهەمان بەرواردا تۆ دەمري، ئەوەي كەدەيلێت حەقو راستييە.

*ئەگەربيني دواي مردوويەك كەوت بەڵام لەگەڵي نەچوە نێو ئەو لانەو ماڵە ياخود چوەنێويو گەڕايەوە لەمردن نزيكدەبێتەوە پاشان قوتاردەبێت.

*ئەگەربيني لەگەڵ مردوويەك سەفەر دەكات كاروبارەكاني لێتێكەڵدەبێت.

*ئەگەربيني مردوويەك شتێكي پێدەدات لەشتە خۆشەويستەكاني دنيا خێرە دەستيدەكەوێت لەلايەكەوە چاوەڕێي نەكردوە.

*ئەگەر مردوەكە كراسێكي نوێي يان پاكو پوختي پێدا بژێوييەكي دەبێت وەك بژێوي رۆژاني تەمەني دنياي.

*ئەگەربيني جبەيەكي دايە شكۆمەنديو رێزي وەك ئەو بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر جلێكي دڕاوي دايە هەژاردەكەوێ.

*ئەگەر پۆشاكێكي پيسو چڵكني دايە سەردەكات بەكاري خراپەدا.

*ئەگەر خواردني دايە رزقو رۆزييەكي پيرۆزو پاك بەدەستدەهێنێ لەلايەكەوە هيچ حسابێكي بۆ نەكردووە.

*ئەگەربینی مردوویەك هەنگوینی دایە دەستکەوتی دەستگیردەبێت لەلایەکی خوازراوەوە.

*ئەگەر کاڵەکێکی دایە غەمو پەژارەیەکی چاوەڕوان نەکراو رووی تێدەکات.

*ئەگەربینی مردوویەك ئامۆژگاریدەکات یان فێری زانیاریەکی دەکات چاکی لەئاینەکەیدا بەدەستدەهێنێ بەئەندازەی ئەوە.

*ئەگەربینی پۆشاکێکیدا بەمردوویەك‌و بلاوینەکردەوەو لەبەرینەکرد زیانە لەماڵ‌و سامان‌و تەندروستیدا بەلاَم چاکدەبێتەوە.

*ئەگەربینی پۆشاکەکەی فرێدا هەتا مردوویەك لەبەریبکات بەلاَم پۆشاکەکە لەشاری زیندوان دەرچوو دەمرێ، ئەگەر دەرنەچوو وەریگرت هەتا درووماني تێدا ئەنجامبدات زیانی پێناگات.

*هەموو شتێك زیندو دەیبینێ دەیدات بەمردوو باش نییە لەدوو حاڵدا نەبێت یەکەم/ئەگەر کاڵەکیدا بەمردوو ئەوە غەم‌و پەژارەی دەڕەوێتەوە لەلایەکەوە چاوەڕێی نەبوە. دووەم/ئەگەر شتیدا بە مام‌و ئامۆژنی دوای مردنیان زیان‌و بژێوی کێشاندەکەوێتە ئەستۆی.

*ئەگەربینی مردوویەك سەلامی لێدەکات بەڵگەیە لەسەر باشی حاڵ‌وباری لەلای خوداوەند.

*ئەگەربینی دەستیگرت ماڵ‌و سامانێکی نائومێد دەکەوێتە دەستیەوە .

*ئەگەر بینی مردوویەك باوەشی پێداکرد وەك خۆشەویست‌و ئازیزێك تەمەندرێژدەبێت.

*ئەگەر باوەشی پێداکرد وەك بەریەرەکانی‌و ناکۆکی خەونەکەی باش نییە.

*ئەگەربینی لەگەڵ مردوویەك دەدوێت تەمەندرێژدەبێت ، ئەم خەونەش بەڵگەیەلەسەر ئەوەی خاوەنەکەی ئاشت دەبێتەوە لەگەڵ کۆمەڵێك دوای شەڕو ناکۆکی.

*ئەگەربینی مردوویەکی نادیار ماچدەکات ماڵ‌و سامانی لەلایەکی چاوەڕوان نەکراوەوە دەستگیردەبێت ، ئەگەر مردوەکە ناسراوبوو سوود لەزانیاری‌و ماڵ‌وسامانی مردوو دەبینێ.

*ئەگەربینی مردوویەکی نادیار ماچیدەکات وەرگرتنی خێرە لەلایەکەوە ئومێدخوازی نەبوە.

*ئەگەر مردوویەکی بینی خواردنێکی کڕی گراندەبێت یاخود نامێنێت.
*ئەگەربینی مردوان خواردن دەفرۆشن یاخود شتومەکو کالا ئەوخواردنو شتومەکە بازاڕساردی رووی تێدەکات.
*ئەگەر لەنێو خواردنو کالاوشتومەکەکاندا مرۆڤێکی مردوو یان مشکێکی تۆپیو یا ئاژەڵێکی تۆپیوی بینی بەڵگەیە لەسەر خراپبوونی ئەو خواردنو شتومەکە.
*ئەگەربینی مردوویەکی نەناسراو مارەدەبڕێ لەگۆڕەکەیدا زینادەکات، ئەگەربینی مارەیبڕیو مەنی لەئامرازی نێرینەی هاتەدەرەوە تێکەڵدەبێت لەگەڵ پیاوێکی دڕندەی دووڕوودوا سەرانەی لێوەردەگرێ.
*ئەگەر مردوویەکی ناسراوی مارەبڕی پیاوبوو یان ژنخوازو داوای بەجێدەهێنێ پێشتر نائومێدبوە لێی.
*ئەگەر پیاوێکی هاوڕێی مارە بڕی وەچەکانی کاری خێر ئەنجامدەدەن، ئەگەر مارەبڕاو دوژمنبوو بکەر زەفەر بەپاشماوەی ئەو مردوە دەبات.
*ئەگەر کەسێکی مەحرەمی مردووی مارەبڕی مارەبڕ خێردەکات بۆ مارەبڕاو یان دوعای خێری بۆ دەکات یاخود خێرێکدەگات بەجێنشینەکانی، گوتراویشە: روو دەکەنە حەرام.
*ئەگەربینی مردوویەکی ناسراو مارەیبڕی سوودو قازانج لەکرداروماڵو سامانی پێدەگات.
*ئەگەر ژنێکی مردووی بینی زیندوبوەتەوەو مارەیبڕیو ئاوەکەی بەرکەوت داواو خواستەکەی دەستیگردەبێتو ماڵو سامانی بەویستو خوازی خۆی دەستگیردەبێ، دیسان دەستەلات بەدەستدەهێنێ لەگەڵ بازرگانیەکی بەسوودو قازانج.
*ئەگەر ژنێکی مردووی هێناو دواتر بۆیدەرکەوت مارەو گواستیەوە ماڵەکەی خۆی کردارێك ئەنجامدەدات لێی پاشگەز دەبێتەوە، ئەگەر جووتبوو لەگەڵیو ئاوەکەی پیسبوو پاشگەزبوەتەوە لەکردارێك کەزەرەرو غەمو پەژارەی تێدایەو دەرەنجامەکەی باشەو خێری لێدەستگیر دەبێت بەئەندازەی بەرکەوتنی ئاوی لەکۆتاییدا.
*ئەگەربینی ژنێکی مردووی کردوە بەهاوسەری خۆیو پاشان بۆیدەرکەوت مارەو چوە لای و دەستی بۆ نەبرد بەلام چوە نێولانەکەیو جێنشینبوو تێدا خەونەکەی بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*(ئەبو سەعد) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ئەگەر مردوویەکت بەدیکرد لەخەودا کارێکی باش ئەنجامدەدات ئەوە هانت دەدات لەسەر ئەنجامدانی ئەوکارە، خۆئەگەر بەدیتکرد کارێکی خراپ ئەنجامدەدات رێگری‌و یاساغی دەکات لەسەر ئەنجامدانی ئەوکارە.

*ئەگەربینی گۆڕی مردوویەکی هەڵدایەوە دەگەڕێت بەدوای ژیاننامەی ئەو مردوەدا لەحاڵی ژیان‌و ئاین‌و دنیایدا هەتا وەك ئەو بژی.

*ئەگەر مردوویەکی بەزیندوێتی لەگۆڕەکەیدا بینی چاکەو دانایی‌و ماڵێکی حەلاڵی دەستگیردەبێ.

*ئەگەر مردوویەکی لەگۆڕەکەیدا بینی ئەو ماڵ‌و سامانە پاکنابێتەوە.

*هەندێکیان دەڵێن: ئەگەربینی روویکردە گۆڕستان‌و گۆڕەکانی هەڵدایەوە زیندوومردووی تێدا بەدیکردن بەڵگەیە لەسەر روودانی کارەساتێکی نارەوا لەوشارو ناوچەیەدا.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا کەم‌و کوڕییە لەئایندا تێکچوونیەتی لەگەڵ بەرزی‌و بڵندی‌و رێزی دنیایە ئەگەر گریان‌و هاواری لەگەڵدابوو پاشان لەسەرشانی پیاوان هەڵگیرا لەسەردارەمەیت بەمەرجێك ئەسپەردەی خاك نەکرێ ئەگەر ئەسپەردەکرا چاکەی لێچاوەڕوان ناکرێ بەڵکو دنیا زاڵدەبێت بەسەریا و شوێنکەوتوانی لەوادەی کارو دەستەلاتیدا بەئەندازەی شوێنکەوتوانی تەرمەکەی دەبێت.

*ئەگەربینی مردوەو شێوەی مردوو دیارنەماوەو گریان‌و شیوەنی تێدا نییە یاخود شتن‌و کفن‌و ئەسپەردەکردن بەڵگەیە لەسەر رووخانی ماڵ‌و دیوار یاخود شکانی پارچەو بەشێك لەو ماڵەدا، هەروەها دەڵێن: لەئاینەکەیدا کوێرەو وێڕای ئەوە تەمەندرێژدەبێت.

*ئەگەر رێورەسمەکانی مردووی بینی لەشتن‌و کنفکردن زیادبوونی ئاینەکەیەتی، ئەو گریان‌و شیوەنەی تێدایە بەرزبوونەوەیەتی لەدنیادا.

*هەروەها دەڵێن: مردن لەسەفەرو گواستنەوەیە یان هەژارییە، ئەوەی بمرێ‌و ئەسپەردەبکرێ تەوبەدەکات، ئەگەر لەگۆڕەکەی هاتە دەرەوە تەوبە دەکات.

*هەروەها دەڵێن: بەشێوەیەکی رەها مرن هاوسەرگیرییە چونکە مردوو پێویستی بەپزیشك دەبێت، شتنیش وەك هاوسەرگیری وایە.

*ئەگەربینی مردوو لەسەر شانی پیاوان هەڵگیرا بەڵام ئەسپەردە نەکرا زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا، ئەگەر شایستەی دەستەڵاتبوو بەدەستیدەهێنێت.

*ئەگەربینی دوای مردنی ژیایەوە دەوڵەمەند دەبێت دوای هەژاری یاخود تەویەدەکات لەگوناهو تاوان.

*ئەگەربینی مردو هەڵگیرا لەسەرشانی پیاوانو ئەسپەردەکرا زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا.

*ئەگەربینی دوای مردنی زیندوبوەوە دوای هەژاری دەوڵەمەند دەبێت یان تەویەدەکات لەدوای گوناهو تاوان، ئەگەر خەوبینەر لەسەفەردابوو بەسەلامەتیو پارێزراوی دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی.

*مردنی ژنی نادیار بەڵگەیە لەسەر وەستانی بارانبارین، ئەگەر ژیا خوداوەند زەوی زیندوودەکاتەوە بەباران.

*ئەگەر مردن لەنێو ژناندا داکەوت بۆ منداڵانەو بەپێچەوانەوەیە.

*ئەگەر مردوو یەك پێی گوت نامرێ لەڕۆژی دواییدا لەپلەوپایەی شەهیداندایە لەنازو نیعمەتدا.

*ئەگەربینی مردوویەکی هەڵگرتوە ئەرکی بژێوی پیاوێکی بێ دین دەگرێتە ئەستۆی خۆی.

*ئەگەر مردوویەکی هەڵگرت بەڵام نەك لەسەر شێوەی هەڵگرتنی مردوو ماڵێکی حەرام بەدەستدەهێنێ، بەڵام ئەگەر لەسەر شێوەی مردوویەك بەسەرجەم ڕێورەسمەکانیەوە هەڵیگرت هەڵدەستێت بەخزمەتی دەستەڵاتدار.

*ئەگەر مردوویەکی بەنەخۆشی بینی بەرپرسە لەکاروبارەکانی ئاینەکەی لەنێوان خۆی پەروەردگارەکەی.

*ئەگەر گۆڕنشینەکانی هاتنە دەروە لەگۆڕەکانیان هاتنەدەرەوەو خواردنی خەڵکیان خواردو هیچیان بۆ بەجێنەهێشتن نرخی خواردن بەرزدەبێتەوە، ئەگەر ئاوی سازکاریان خواردەوە لەبیرەکان دوای ئەوە بەڵاو نەهامەتی بڵاودەبێتەوە.

*ئەگەر مردوویەکی ناسراوی بینی مردوەتەوەو دەگرین بۆیو هاوارو قیژەقیژ کەسێکی جێنشینی ئەو مردوە دەمرێت، ئەوەی مردوو دەربارەی خۆی رایدەگەیەنێ راستو حەقە چونکە لەلانەی حەقدایەو دنیاش بەتاڵو پووچە.

*ئەگەر مردووەکە شتێکی پێ ڕاگەیاند نەدەبوو خەوی تێکەڵو پێکەڵە، بەهەمان شێوە ئەگەر بەنەخۆشی بینی گیرۆدەی دەستی گوناهو تاوانە.

*ئەگەر نوێژی لەسەر مردووکرد بەزەیی پیایاندا دێتەوە سەردانی گۆڕەکانیان دەکات.

*ئەگەربینی نوێژ لەسەر مردووەکان ئامۆژگاری پیاوێکی ڕەقو زبر دەکات یاخود ئامۆژگاری پیاوێکی نەزاندەکات.

*ئەگەربینی هاوسەرەکەی مردو پاشان زیندووبوەوە لەکشتوکاڵەوە سوودو قازانجدەکات، ئەوەی مردوویەکی دۆزییەوە ماڵوسامان بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەربینی بەشوێنەواری مردوویەکدا دەڕوات پابەندی ژیاننامەکەی دەبێتو شوێنەواری لەدنیاو ئایندا دەسڕێتەوە.

*ئەگەربینی ئیمامو پێشەواکەی مرد ولات وێراندەبێ، هەروەك چۆن ئەگەر بینرا ولات وێرانبوو ئیمام دەمرێ.

*ئەگەربینی ئەمرد چارەنووسی نزیکبوەتەوە.

*مردن قوربانیو خێرە لەبری گوناهێکی گەورە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەربینی لەخەوەکەیدا دەمرێ بەبێئەوەی نەخۆشبێ تەمەنیدرێژدەبێ.

*ئەگەربینی لەسەرەمەرگدایە ستەم لەخۆیو کەسانیتر دەکات.

*ئەگەربینی هەواڵی مردنی پیاوێکی غەریبی بیست هەواڵی تێکچوونی ریشو دنیای دێت.

*ئەگەربینی کوڕێکی مرد لەدوژمنەکەی قوتاردەبێت.

*ئەگەربینی کچەکەی مرد نائومێد دەبێ لەدەرووی خێر.

*ئەگەربینی مردو ئەسپەردەکرا ئەگەر ئەمانەت پارێزبوو بەزۆر لێی وەردەگرن، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ.

*ئەگەربینی مردو ئەسپەردەکراو هاوسەرداربوو لەژنەکەی یا شەریکەکەی یاخود براو هاوڕێکانی جیادەبنەوە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەرو غەریبی، ئەگەر لەسەفەردابوو دەگەڕێتەوە بۆ لای خانەوادەکەی.

*مردن بەڵگەی خێرە، بۆیەکێك کەلەشتێك بترسێ یان غەمباربێت.

*ئەگەر نەخۆشێك بینی مرد بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی لەنەخۆشیەکەی.

*مردنی چەند برایەك بەڵگەیە لەسەر مردنی دوژمنانو قوتاربوون لەزەرەرێکی چاوەڕێکراو.

*ئەگەرخۆی لەنێو کۆمەڵێکی مردوودا بینیەوە لەنێو کۆمەڵێکی دووڕوودایە.

*ئەگەربینی هاوەڵایەتی مردوویەك دەکات سەفەرێکی دوور دەکەوێتە بەرێو لەوسەفەرەدا خێری دەستگیر دەبێت، ئەگەر مردووەکە شتێکی خوارد بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی.

*ئەگەر خۆی بەمردوو چواند خۆشحاڵدەبێتو خواردنی مردوو بۆ شتێك بەڵگەیە لەسەر گرانی ئەو شتە.

*ئەگەربینی لەژووری مردوو شۆڕدایە ناوبانگی بڵاودەبێتەوەو لەگوناهەکانی قوتاردەبێتو لەقەرزاری رزگاریدەبێت.

*ئەگەر مردوویەك داوای لەکەسێککرد جلوبەرگی بۆ بشوات هەژاریەتی یاخود دوعاو نزایە بۆئەوەی بینیویەتی یاخود قەرزدانەوەو گەردن ئازادییە لەوەی ستەمی لێکردوەو بەجێهێنانی وەسیەتنامەیە یاخود شتێك کەئەو لێی بەرپرسە، ئەگەر مرۆڤێك شتی هەڵوەشانو تیاچوونی لەژێردەستی ئەودا دەبێت.

*ئەگەر مردوویەکی بینی زیندوبوەتەوە کارێکی مردووی بۆ زیندودەبێتەوە، ئەگەر لەناڕەحەتیدابوو کاری ئاسان رووی تێدەکات لەلایەکەوە چاوەڕێی نەبوە.

*ئەگەربینی مردوویەکی زیندوکردەوە لەسەردەستی ئەودا جوولەکەیەك یا مەسیحیەك موسوڵماندەبێت.

*ئەگەربینی مردوو زیندودەکاتەوە رێنومایی کۆمەڵێکی مردوو دەکات یان بیدعەچیان لەسەر دەستیدا تەوبە دەکەن لەسەر ئەو گوناهانەی سووربوە لەسەری.

*ئەگەر مردوانی بینی جارێکیتر دەمرنەوە بەڵگەیە لەسەر مردنی کەسێك کەهەمان ناوی ئەو مردوەی هەڵگرتوە.

*ئەگەر پیاوێکی مردووی بینی ژنێکی زیندووی هێنا بەمارەبییەکی نوێو گۆڕی بۆ ماڵی خۆی مردنیەتی.

*ئەگەر زیندوویەك بینی دوای مردووکەوتوەو چوە نێو ماڵێکەوەو هاتە دەرەوە لێی لەمردن نزیکدەبێتەوەو پاشان قوتاردەبێ.

*ئەگەر دوای مردوویەك کەوتو پاشان لەگەڵی نەچوە نێوماڵەکەوە لەمردن قوتاردەبێت.

*ئەگەر مردوویەکی بینی کرایە پیسیەکەی دایە هەژار دەکەوێت.

*ئەگەربینی مردوو لێی دەدرێ یان زیندودەبێتەوە پشتی لێدەکات زیندووەکە لەئاینەکەیدا خراپە دەکات

ئەوجا مردوو رازی نابێت مەگەر بەوەی خودا پێی رازییە چونکە ئەو لەلانەی حەق‌و راستیدایە.

*ئەگەربینی زیندویەك لەمردوویداو مردوەکە ملکەچ‌و رامبوو بۆی هێزی زیندوە لەئاینەکەیداو گەیشتنی خێرو دوعایە یاخود ئامۆژگارییە بەجێهێنا.

*ئەگەر مردوویەکی نوستووی بینی لێیدەدات خێری دەستگیردەبێت لەسەفەرەکەی‌و ئەوەی لێیدەرچوە بۆیدەگەڕێتەوەو لێدانی قەرزدانەوەیەتی.

*ئەگەر مردوویەکی بینی کارێکی باشی ئەنجامدا فەرمانی ئەنجامدانی کارێکی لەوچەشنەی پێدەدرێت، ئەگەر خراپبوو واز لەدەستبەرداربوونی دەهێنێت.

*ئەگەر زیندوویەکی لەنێوان مردوودا بینی سەفەرێکی دووروودرێژ دەکەوێتەبەری‌و ئاینەکەی تێکدەچێ.

*ئەگەر خۆی لەگەڵ مردوەکاندا بینی‌و زیندوبوو لەگەڵ کۆمەڵێکدا تێکەڵدەبێ کەئاینەکەیان شێواوە.

*ئەگەر زیندوویەکی بینی دوای مردوویەك دەکەوێت‌و شوێنەواری هەڵدەگرێ لەچوونە ژوورو هاتنەدەرەوەی ئەو زیندوە پابەند دەبێت بەو مردوەوە لەوەی کەمردوەکە لەسەریەتی لەئاین‌و دنیایدا.

*ئەگەر مردوویەکی بینی مرد بەموشریکی نموونەی دانایی دەهێنێتەوەو قسەی چاکەو راستدەکات.

*ئەگەر بێباوەڕێکی مردووی بینی جل‌وبەرگێکی دڕاوی لەبەردابوو خراپی حاڵ‌وباریەتی لەقیامەتدا.

*ئەگەر جوولەکەو مەسیحی‌و ئاگرپەرستێ ببینێ مردوویەك لەسەر جێگەیەکەو جل‌وبەرگی سەوزی لەبەردایەو تاج‌و سەوڵەدان لەسەرسەریبوو بەڵگەیە لەسەر بەرزبوونەوەی‌و شکۆمەندی‌و بەدەستهێنانی خێرو خۆشی‌و شادی‌و مەزنی.

*ئەگەر مردوویەکی بینی پێیگوت هەرگیز نامرێ لەپلەوپایەی شەهیداندایەو لەقیامەتدا نازو نیعمەت رووی تێدەکات.

*ئەگەر مردوویەکی بینی بەزیندوویەکی گوت دەمریت، دەگات پێی لەکاتێکی دیاریکراودا لەودەمەدا لەورۆژ مانگ‌و ساڵەدا.

* ئەگەربینی دایکی دەمرێ حاڵی دنیای بەسەردەچێتو دەشێوێت، ئەگەر لەخوازیارانی قیامەتبێ دەست لەکاری دەکێشێتەوەو لەبەجێهێنانی فەرزەکان دووردەکەوێتەوە.
* ئەگەربینی براکەی مردوەو نەخۆشبوو ئەوە مەرگیەتی، وەگەرنا یەکێك لەوانەیە کەبرایەتی لەگەڵدەبەستێ یان پشتی پێدەبەستێ.
* خۆئەگەر برابنەبوو مردنی براو کەسێکی نزیکی بینی دەمرێ یان ماڵو سامانی بەسەردەچێت، ئەگەر هەژاربوو چاوێکی دەپێکرێ یاخود دەستێکی دەپێکرێ.
* ئەگەربینی هاوسەرەکەی دەمرێ ئەوە پیشەسازییەکەی دەوەستێ.
* ئەگەر مردوویەکی بینی بوە بەدەستەلاتداری ولاتێك یان گەڕەکێك ژیاننامەی ئەو مردوە زیندودەبێتەوەو ژێردەستەکانی فەرمانڕەوا بەهەمان ڕێبازدا دەڕۆن یاخود کەسێکی خۆی بەهەمان ڕێبازی ئەودا تێدەپەڕێ.
* ئەگەربینی زانایەکی مردوو یاخود پیاوچاکێكو زانایەکی لەشوێنێکدا بینی ئەگەر لەجەنگدابوون یان نەبوونی دڵنیایی دەروویان لێدەکرێتەوەو حاڵوباری سەرۆکەکەیان چاکدەبێتو ژیاننامەیان باشدەبێت.
* ئەگەر یەکێك لەفێرعەونەکان لەولاتێکدا بینرا یان بوو بەفەرمانڕەوای ستەم لەو ولاتو شارەدا دەرکەوێت لەگەڵ خراپی بژێوی.
* ئەگەربینی مردوویەکی هەڵگرت وەك شێوەی هەڵگرتنی تەرم دوای دەستەلاتدارێك دەکەوێت، بەهەمان شێوە ئەگەر لەسەر شان هەڵیانگرت یاخود لەدەفرێکدا.
* ئەگەربینی نوێژ لەسەر مردوویەك دەکات شەفاعەت بۆ پیاوێکی بەدوخراپدەکات.
* ئەگەربینی مردوویەك لەلایەکەوە بانگیکرد لەلایەکی نادیارەوەو نەیبینیو وەلامیدایەوە دەمرێو دەگات بەو مردوە.
* ئەگەر مردوویەکی بینی لەدەریایەکدا نوقمبوو لەهەڵەو گوناهدا نوقمدەبێ.
* ئەگەربینی مردوان لەگۆڕەکانیان راستبوونەوەو گەڕانەوە بۆ لانەو ماڵەکانیان ئەوە لەزیندان قوتاردەبێت یاخود خوداوەند ڕوەك زیندودەکاتەوە دوای مردنی.
* دەگونجێت مردن بەڵگەبێت لەسەر گۆشەگیری بەهۆی راوبۆچوون دنیانەویستییەوە.

*دەگونجێت مردنی کتوپڕ بەڵگەبێت لەسەر گەشتی هەژار.

*مردنی پێغەمبەران(ﷺ) لەخەودا لاوازی ئەوان و ژیانیانەو واژووی ئەوەیە.

*مردنی پاشا بەڵگەیە لەسەر لاوازی سەربازان و مەرگی زاناش بەڵگەیە لەسەر پووچەڵبوونەوەی بەڵگەی خەوبینەرە، دەگونجێت مردنی زانا بەڵگەبێت لەسەر بیدعە لەئایینداو مردنی خواناس هەڵگەڕانەوەی خەوبینەرە لەبەندایەتی.

*مردنی پیشەوەر بازاڕ ساردی پیشەکەیەتی و مردنی باوك و دایك تەنگی بژێوییەو مردنی ژن دنیایەکی بەسەر چوەو مردنی کچ پچڕانی باس و خواسیەتی، مردنی ئەوەی پەنای پێدەگرێ لەکاری چاکسازیدا یاخود پوچەڵبوونەوەی سەفەرەکەی یان زەرەرێکە بەپێ و ئەندازەی .

*نوێژی مردوو لەسەر مردووکرداری پووچ و بەتاڵە چونکە هەردوو مردووکارەکانیان بەتاڵ و پووچەڵبوەتەوە، یاخود هەستدەکات قەرزێکی لەسەرە شەفاعەت دەکات بۆ کەسێك شەفاعەتی لێقبوڵ ناکات.

*بردنی جل وبەرگ و خواردن یان ئاژەڵ زیادەو رزق و رۆزییە ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر خێر. ئەگەر لەگەڵ مردوەکەدا جوولەکەو مەسیحی هەبوو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرکرداری مردوو پاشان خوداوەند قوتاریدەکات لەئاگرو دەرووی لێدەکاتەوە.

*هاوسەرگیری مردوو لەگەڵ ژنێك هاوسەرگیرییە یان تەلاقە.

*دەگونجێت هاوسەرگیری بەڵگەبێت لەسەر باشی حاڵی لەلای پەروەردگار.

*بینینی مردووی موشریکەکان لەخەودا دوژمنان و مردووی خاوەن کتێبان رۆچوونە لەئایندا لەگەڵ نوێبوونەوەی غەم و پەژارە.

**مرواری(گەوهەر)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: مرواری ریزبەندکراو لەلێکدانەوەدا قورئان و زانیارییە.

*ئەگەر بینی مرداوارییەك کوندەکات بەڕاستی قورئان راڤەدەکات.

*ئەگەر بینی مرواری فرۆشت یان قوتیدا قورئان لەبیر دەکات.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی مرواری دەفرۆشێ زانیاری پێدەدرێ و ئەویش لەنێوخەڵکیدا بڵاویدەکاتەوە.

*خستنەدەمی مرواری بەڵگەیە لەسەر باشی ئاین.

*ئەگەر بینی مرواری بڵاودەکاتەوە لەدەمیەوە و فڕێی دەداتو خەڵکی کۆیدەکەنەوە بەڵام خۆی هەڵیناگرێ ئامۆژگاریدەرێکی بەسوودە.

*هەروەها دەڵێن: مرواری ژنە دەیهێنێت یان خزمەتکارە، گوتراویشە کوڕە بەپێی ئایەتی: ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَنْثُورًا﴾(الانسان:١٩).

*بەئەمانەت وەرگرتنی مرواری بەڵگەیە لەسەر کوڕێك ناژێ.

*دەرهێنانی مرواری زۆر لەقووڵایی دەریا یان لەدەریادا ماڵێکی حەڵاڵە لەلایەن هەندێك کاربەدەستەوە.

*مرواری زۆر میراتییەو بۆ فەرمانڕەوا دەستەڵاتەو بۆ زانا زانیارییو بۆ بازرگان سوودو قازانجە.

*مرواری پڕو تەواوی هەمووشتێکەو ئەوەی ببینێ مرواری کوندەکات بەدار ژنێکی مەحرەم مارە دەبڕێ.

*ئەگەر مرواری قووتدا گەواهیو شەهادەت دەشارێتەوە.

*ئەگەر مرواری مژی غەیبەتی خەڵکیدەکات.

*ئەگەر بینی رشایەوەومرواریبوو پاشان مژیو دیسان قووتیدایەوە پلان لەخەڵکی دەگێڕێو غەیبەتیان دەکات.

*ئەگەر مرواریيەکی زۆری بینی لەدەریادا دەریهێنا ماڵێکی حەڵاڵ لەگەنجینەی فەرمانڕەوایان بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی مرواریيەکە دوورکەوتەوە ئەوا دەڵێن تووشی ناڕەحەتیدەبێت.

*ئەگەر بینی دەرگای گەنجینەیەکی بەکلیلکردەوەو، مرواری لێدەرهێنا پرسیار لەزانایەك دەکات دەربارەی بابەتێك، چونکە زانا گەنجینەیەو پرسیارلێکردنیشی کلیلە.

*دەگونجێت شەقڵی کچێنی کچێك بباتو کوڕێکی لێببێت.

*ئەگەر بینی مرواری هەڵدایە نێو رووبار یان بیرێك چاکە لەگەڵ خەڵکی ئەنجامدەدات.

*ئەگەر بینی مرواریو بەرگەکەی لەیەك جیاکردەوەو بەرگەکەی بردو فڕێیدا گۆڕهەڵکەنە.

*مرواری گەورە باشترە لەپچووك، دەگونجێت گەورەکەی بەڵگەبێت لەسەر سوورەتە درێژەکانی قورئان.

*مرواری ریزبەندکراو بەڵگەیە لەسەر کوڕ، ئەگەر شاراوەبوو شچە، دەگونجێت پەرشوبڵاوەکەی بەڵگەبێت لەسەر قسەوگوتەی جوان.

*هەموو جۆرەكانی مرواریو گەوهەرو هیتر بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستیو حەزو ئارەزووی ژنانو كوڕان.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: دووپیاوم بینی گەوهەریان خستبوە نێودەمیان، یەكێكیان بچووكەكەی لەدەمیا دەردەهێناو ئەویتر گەورەكەی دەخستەنێودەمی، ئەویش وتی: ئەوپیاوەی مرواریيە بچووكەكەی دەردەهێنا ئەوەیە نیشانی منداوەو منیش باس لەوە دەكەم كەبیستومە، بەلأم ئەوەی گەورەكەی دەرهێنا نیشانی (حەسەن)ی (بەسری)تداوەو لەگەڵ بەندایەتییەكی زیاتر لەوەی بیستومانە.

*ژنێك هات بۆلایو وتی: من لەئامێزمدا دووگەوهەرم بینی، یەكێكیان لەویتر مەزنتربوو خوشكەكەم داوای یەكێكیانی لێكردمو بچووكەكەم دایە، (ئیبن سیرین)وتی: تۆ ژنێكی فێری دوو سورەت دەبی، یەكێكیان لەوی دی درێژترە، خوشكەكەت فێری بچووكەكەیان دەكەیت، ئەویش وتی: راستدەكەی، فێری سوورەتی (البقرة)و (آل عمران) بوومو خوشكەكەم فێری (آل عمران)كردوە.

*پیاوێك هات بۆلایو وتی: لەخەودا بینیم مرواری قوتدەدەم، پاشان فڕێی دەدەم، وتی: تۆپیاوێكی هەركات قورئان لەبەر بكەی لەبیریدەكەیت بۆیە لەخوابترسە.

*یەكێكیتر هات بۆلای وتی: لەخەودابینیم بەسەر مرواریدا دەرۆیشتم ، وتی: مرواری قورئانەو نابێت قورئان بخەیتە ژێر پێوە.

*یەكێكیتر هات بۆلایو وتی: لەخەودا بینیم دەمم پڕبوە لەمرواریو ناتوانم دەری بهێنم، پێی وت: تۆ پیاوێكی قورئان باشدەزانی بەلأم نایخوێنی، ئەویشوتی: راستدەكەی.

*یەكێكیتر هات بۆلای وتی: بینیم لەیەكێك لەگوێچكەكانمدا مرواری هەبوو وەك گوارە، وتی: لەخوابترسەو قورئان وەك گۆرانی مەخوێنە.

*یەكێكیتر هات بۆلای وتی: لەخەودا بینیم مرواری لەدەمم دێتەخوارەوەو، خەڵكی دەیبەنو منیش هیچی لێنابەم، وتی: تۆپیاوێكی قسەتیژو حیكایەتخوانیو ئەوەی دەیڵێیت كاری پێناكەیت.

(نابلسی)دەڵێت: مرواری خزمەتكاری زۆرو میراتیەكی بێشومارە بۆ یەكێك چاوەڕێی بكات.

*مرواری بۆ زانا زانیارییەو بۆ فەرمانڕەوا دەستەڵاتەو بۆ بازرگان بازرگانییەو بۆ بازاڕیو پیشەوەر پیشەکەیەتی.
*مرواری تەواویو کامڵی هەموو شتێکە لەگەڵ جوانیو قەشەنگی.
*ئەگەر بینی مرواری کوندەکات گەواهیو شەهادە دەشارێتەوە.
*ئەگەر بینی مژی غەیبەتی خەڵکیدەکات، ئەگەر ڕشایەوەو دیسان مژیو دواتر قوتیدا غەیبەتی خەڵکیدەکات.
*ئەگەر بینی مرواری فڕێدایە نێو ڕوبارێك چاکە لەگەڵ خەڵکیدەکات.
*بەرگی مرواریو فڕێدانیو کۆکردنەوەی بەرگەکەی گۆڕهەڵکەندنە.
*ئەگەر بینی گەنجینەیەکی کردۆتەو بەکلیلێكو مرواری لێدەردەهێنێ پرسیار لەزانایەك دەکات دەربارەی بابەتێك.
*ئەگەر مروارییەکی بینی زۆر خۆشحاڵدەبێ.
*ئەگەر مرواری پێدرا پلەوپایە بەدەستدەهێنێ.
*ئەگەر بینی مرواریيەکی قوتدا پاشان هەڵیدا هەر ئایەتو سوورەتێکی قورئان لەبەر بکات زوو لەبیریدەکات.

*مرواری مارەبڕینە یان گرێبەستی ماڵوسامان یان خوێندنی سەراپای قورئانە.
*ئەگەر بینی مرواریيەك فڕێدەداتە نێوجەمامێك قورئان لەڕێگە چەپەکاندا دەخوێنێتەوە.
*ئەگەر بینی مرواری بەدەستدەهێنێو دەیخاتە دەمی فێری قورئاندەبێ پاشان فێری کەسیناکات.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر چەندبارە مرواریەکیان بۆ هێنا غەمو پەژارەیە.
*ئەگەر بینی مرواری قوتدا دانایو زانیارییە لەبەریدەکات.
*ئەگەر بینی مرواری ڕیزبەندکردو فڕێدەدایە نێو زبڵو سەر ڕێگە یان شوێنێك زانیاری لەلای کەسانی دی باسدەکاتو سووکایەتی پێدەکات.
*ئەگەر بینی ئاگر دەکاتەوە بەمرواری لەشوێنی دارو تەنوری پێگەرم دەکات مرۆڤێك ناچاردەکات لەسەر کارێك کەدەیوروژێنێ لەقسەو گوتەی چاکە.
*مرواری گەورە باشترە لەبچووکەکەی، دەگونجێت گەورەکەی بەڵگەبێت لەسەر سوورەتە درێژەکانی قورئان، مرواری ناکونکراو بەڵگەیە لەسەر کچو کونکراویش ڕزقو ڕۆزییەکی خێرایە هیچ ماندوبوونێکی تێدانییە.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر فرمێسكو ئەشك چونكە فرمێسكیان بەمرواری چواندوە.

**مرواری ژن:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بەپاوانەوەبوو چاكەی مێردەكەیەتیو چاكەكردنیەتی لەگەڵیدا بەئەندازەی دەنكەكانی مرواریو جوانی، ئەگەر مرواریەكە رێك نەبوو بۆ پیاوو ژن زیانە.

*ئەگەر مرواریەكە زیوبوو لاوازی ژنەكەیەتی.

**مرۆڤ:** ئەوەی لەخەودا یەكێك لەشێوەی مرۆڤدا ببینێتو نەیناسێتو لەكەسێك نەچێت بیناسێت دەگونجێت ئەو روحو شێوازە روحو نەفسی خۆی بێتو خوداوەند نیشانیبدات.

*ئەگەر ئەو كەسەی بینی كردەوەی چاكە دەكات خۆیەتی.

*ئەگەر بینی لەخەودا كردەوەی خراپە دەكات هەر خۆیەتی.

*دەگونجێت ئەوكەسە سنوورو كۆتایی بێت یان رزقو چارەنووسیبێت.

*ئەگەر دووكەس ببینێتو بترسێت دڵنیا دەبێت.

*ئەوەی پیاوێك ببینێتو بیناسێت خەوەكەی بەڵگەیە لەسەر وەرگرتنی شتێك لێی یان هاوچەشنی ئەوە.

*ئەگەر بینی شتێكی لێوەرگرت پێی خۆشبوو ئومێدو هیوای بەدەست دێنێت لەدەسەڵات ئەگەر شایستەبێت.

*ئەگەر بینی وەك كراسێكی نوێی لێوەر بگرێت دەسەڵاتی پێدەبەخشێتو، ئەگەر ماڵی لێسەند نائومێددەبێت لێیو دژایەتیو ئاژاوە دەكەوێتە نێوانیان.

*هەموو مرۆڤێكی ناسراویش لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+خودی خۆی.

+رەگەزی.

+هاوچەشنی.

+شاروپیشەكەی.

*ئەوەی مرۆڤێكی ناسراو ببینێت ئەو مرۆڤە پلەوپایەی بەرز دەبێتەوە، ئەگەر خۆی خاوەن پلەوپایەبوو نزم دەبێتەوە یا بەلاو ئەهامەتی رووی تێدەكات ئەوەش بەڵگەیە لەسەر شەڕ یان خێر هەروەك بینیویەتی.

**مرۆڤی نێر:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر چاكەو فراوانیو گوشادی.

**مریشك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مریشك ژنێكی گێلی زبرو رەقە ، خاوەن جوانییەو لەوەچەی پادشاو میرانە

یاخود وەچەو منداڵی کەنیزەکو خزمەتکارە، ئەوەی ببینێ لەخەودا مریشك سەر دەبڕن، ئابڕووی کچێکی داوێنپاك دەبات، ئەوەشی راویبکات ماڵو داراییەکی حەڵاڵی دەستدەکەوێت، ئەوەی لەگۆشتەکەی بخوات لەلایەن عەجەمەوە ماڵێکی حەڵاڵی دەستکەوێت.

*ئەگەر بینی مریشكو تاوس لەماڵەکەی دەخوێنن خاوەنی بەڵاو نەهامەتیو داوێنپیسییە.

*هەروەها دەڵێن: مریشكو پەڕوباڵی ماڵو داراییەکی بەسوودو قازانجە.

(نابلسی) دەڵێت: دەگونجێت مریشك لەخەودا ژنێك بێت هەتیو بەخێو بکاتو هەوڵو کۆششیان بۆ بکات لەپەیداکردنی خێرداو گسکیان بۆ بدات لەوپێناوەدا، بێگومان ئەو ژنە سوودمەندە.

*مریشکی هەڵنیشتوو ژنی چوستو چالاکو خاوەن بنەچەیە.

*مریشکی زیڵدانو سەرخۆڵیش ژنی بێچەڵەكو بنەچەیە بارۆکەکانیشی وەچەی نێرینەیە کەلەزیناوە پەیدابوون.

*دەگونجێت مریشك بەڵگەبێت لەسەر ژنی خاوەن منداڵو چوونە ژوورەوەی مریشك بۆلای نەخۆش بەڵگەبێت لەسەر چاکبوونەوە، هەروەها بارۆکەش بەو چەشنو شێوازەیە.

*بانگدانی مریشك شەڕو خراپە یاخود بەرگە.

*دەگونجێت هاتنە ژوورەوەی مریشك بۆ لای کەسی لەش ساغ ئاگاداری تووشبوونی بێت بەنەخۆشییەك تێدا پێویستی بەکات هەبێت بۆئەوەی چاك ببێتەوە.

*دەگونجێت هاتنە ژوورەوەی مریشك یان خاوەنداریتی بەڵگەبێت لەسەر رەواندنەوەی غەمو پەژارەو خۆشیو شادیو نیعمەتداری.

*بارۆکە کورە یاخود جلوبەرگێکی دەرچەو کوندارە، یان دەروی خێرە بۆ یەکێك لەنارەحەتیدابێت.

*ئەگەر مریشکێکی زۆر لەماڵەکەیدا بێتو بەهیچ شێوەیەك ئەژمەردە نەکرێت دەستەڵاتداریو دەوڵەمەندییە، ترسو بیمەکەشی دەرەوێتەوەو حاڵو باری سەقامگیر دەبێت.

**مریشکەبەگر:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر چنەری حەسیرو سووروسپیو بەرەی ئاوریشم یان دروستکەری راخەر. هەروەها

بینینی بەلگەیە لەسەر شکۆمەندیو مەزنیو خۆشەویستیو تەبایی.

**مریشکەوان**:(نابلسی)دەلێت: بینینی بەلگەیە لەسەر دەرولێکردنەوەو رەواندنەوەی غەمو پەژارەو بازرگانی کەنیزەکو کۆیلە.

*دەگونجێت بینینی بەلگەبێت لەسەر چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

**م ز**

**مزری (ترشۆکە)**:(نابلسی) دەلێت: مزریو ترشۆکە لەخەودا بەلگەیە لەسەرچاکبوونەوە لەنەخۆشیو ناساغی. دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر رووپامایيو دووڕوویی بەهۆی خۆشی سەرەتاو کۆتای دوایيەکەی.

**مزگەوت**:(ئیبن سیرین)دەلێت: (عەبدولعەزیز)ی کوڕی (ئەبوداود) دەلێت: پیاوێکی دەشتەکی مزگەوتێکی بەحەوتبەرد دروستکردو هەرکات نوێژێکی دەکرد دەیگووت: ئەی بەردەکان من پێتان دەلێم خوداوەند تاکو تەنیاو بێهاوتایە ، پاشان ئەم پیاوە مردو روحەکەیان بەرزکردەوە روو بەئاسمان ئەویش وتی: منیش لەخەودا بینیم وتی ـ کاتێ بردیانم بۆ دۆزەخ هەریەک لەو بەردانە بەئەندازەیەک گەورەبوون دەرگاکانی دۆزەخیان لێگرت.

*مزگەوت بەلگەیە لەسەر:

+قیامەت.

+کابەی مالی خودا.

+شوێنی کۆبوونەوە پەیداکردنی سوودو قازانج.

+کۆڕی یادو زیکر.

+مەیدانی جەنگو شەڕ.

*ئەگەر کەسێک مزگەوتێک دروستبکات شایستەی دادگابوو پۆستی دادوەری وەردەگرێ یان فتوا.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر زانای خاوەن کتێبو نووسراو، بۆ کاغەزفرۆش بەلگەیە لەسەر نووسینەوەی قورئانی پیرۆز ، بۆ رەبەن بەلگەیە لەسەر مارەبڕینو هاوسەرگیری، بۆ خوازیارانی مالو دارایيو دنیا بەلگەیە لەسەر دروستکردنی بیناو ساختمانێک کەبەردەوام سوودو قازانجی بۆیدەبێ وەک حەمامو ئوتێلو فرۆشگاو فڕنو کەشتیو هاوچەشنی ئەمانە.

*ئەگەر مزگەوتێکی رووخاند وازووی ئەوەیە کەدروستیکردووەو بەلگەیەلەسەر هەولولێبڕانی بۆئەوەی دروستیدەکات.

*ئەگەر فرۆشگایەکی دروستکرد دنیای زاڵکردووە بەسەر قیامەتدا.

*ئەگەر گەرماوێکی دروستکرد ئاینی تێکدەچێ بەهۆی ژنێکەوە، ئەگەر لەشوێنەکەی چاڵێکی هەڵکەند گوناهبار دەبێ بەگوناهێك کەئەنجامی دەدات یاخود لەپێناوی کۆمەڵێکدا کەوا لەسەر زانیاری‌و خێر لێی جیابونەتەوە یان دادوەرێك کەلەکاریخستوە یاخود پیاوێکی چاك کوشتویەتی یان شوێنێك پشوو یان هاوسەرگیری تێدابێت‌و پووچەڵیبکاتەوە.

*ئەگەر خۆی بەدەر لەجل‌ویەرگ بینی لەمزگەوتێکدا خۆی دادەماڵێ لەوەی شایستەیەتی، ئەگەر لەرۆژانی (حەج)دابوو (حەج)دەکات پشت بەخوا بەتایبەت ئەگەر بانگی تێدایا، ئەگەر گوناهباربوو رووله تەویەو پەشیمانیدەکات، ئەگەر لەسەر حاڵەتێکی جیاواز نوێژی تێدادەکردو رووی نەکردبوە قیبلە روو لەدنیاگەری دەکات‌و لەبازارێکدا خۆی سەرقاڵدەکات، ئەوجا بێبەشدەبێ لەدنیاش چونکە نوێژەکەی نادروستەو زەرەرکردنیشی هیلاکی‌و ماندوبوونیەتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خراپی ئەوەی رووی تێدەکات لەبێئاگایی لەحەرام‌و سووخۆریدا.

*بینینی مزگەوتی (حرام)بەڵگەیە لەسەر (حەج) بۆ یەکێك یەکلایی بووبێتەوە تێدا یان بانگی تێدا دابێ، ئەگەر ئەوە لەرۆژانی (حەج)دا نەبوو وەك خۆیەتی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ماڵی دەستەڵاتدار بۆیەکێك بیەوێت لەنێویدا دڵنیابێت.

*هەروەها بەڵگەیەلەسەر:

+لانەو ماڵی زانا.

+مزگەوتی گەورەی شار.

+بازارێکی گەورەو مەزن وەك بازاڕی پارەگۆڕینەوەو زەڕەنگەران.

*(ئەبوسەعد)دەڵێ: ئەگەر مزگەوتێکی بینی ئاوەدانبوو ئەو مزگەوتە پیاوێکی مەزنەو خەڵکێکی زۆر لەدەوری کۆدەبنەوە لەخێرو چاکەو یادی خودایا بەپێی ئایەتی: ﴿يُذكر فيها اسمُ الله كثيرًا﴾(الحج: ٤٠).

*ئەگەر بینی مزگەوتەکە رووخا سەرۆکێکی بەئاین لەو شوێنەدا دەمرێ.

*ئەگەر بینی مزگەوتێك دروستدەكات رایەڵـەی خزمایەتی دەگەیەنێتو خەڵكی لەسەر خێر كۆدەكاتەوە.
*دروستكردنی مزگەوت بەڵگەیە لەسەر زاڵبوونو سەركەوتن بەسەر دوژمناندا بەپێی ئایەتی: ﴿قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا﴾(الكهف :٢١).
*ئەگەربینی پیاوێكی نادیار بەرنوێژی بۆ خەڵكیكرد لەمزگەوتێكداو پێشەواو ئیمامی ئەو مزگەوتە نەخۆشبوو دەمرێ.
*ئەگەربینی مزگەوتێك بوە بەحەمام بەڵگەیە لەسەرنەوەی پیاوێكی حاڵو باردابۆشراو كاری خراپە ئەنجامدەدات.
*ئەگەربینی ماڵەكەیبوە بەمزگەوت رێزو پلەی بانگخوازی بۆ حەقی پێدەدرێ.
*ئەگەربینی لەگەڵ كۆمەڵێكدا چوەتە نێو مزگەوتیو چاڵێكیان بۆ هەڵكەند ژنەدەهێنێ، ئەگەربینی لەنێو دوانگەكەدا نوێژدەكات مژدەیە بۆی بەپێی ئایەتی:﴿فَنَادَتْهُ الْمَلَائِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ﴾ (آل عمران:٣٩)

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پیاوێكی زانایە، دەرگاكانیش پیاوانی زاناو پارێزەرانی مزگەوتن.
*مزگەوت بەڵگەیە لەسەر بازاڕو بازرگانی، مزگەوتی بەرز كەپلیكانە پێدا سەردەكەوێ رژدییە بەوەی كەهەیەتی، ئەگەر سووكو نزمبوو بەڵگەیە لەسەر ئاسانكردنی كاروبارو بەدەستهێنانی پێداویستی ئەوەی بەڵگەیە لەسەری.
*ئەگەر لەمزگەوتی شارەوە چوو بۆ مزگەوتی لادێ بەڵگەیە لەسەر پوچەڵكردنی كاتەكانیو پچڕانی رایەڵەی كۆمەڵەكەی یاخود گۆڕانی حاڵوباری واژووی ئەوەیە گەر لەمزگەوتی گوندەوە چوو بۆ شار.
*ئەگەر مزگەوتو شوێنێكی لەبۆخودا دروستكرد ئەگەر پادشابوو حەق جێبەجێدەكاتو فەرمان بەچاكەدەكاتو رێگری لەخراپە، ئەگەر زانابوو كتێبێك دەنووسێو خەڵكی سوود لەزانیاریو فتواكانی وەردەگرن، ئەگەر ماڵو ساماندابوو زەكاتی ماڵو سامانەكەی دەدات، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ ، ئەگەر هاوسەرداربوو كوڕێكی دەبێتو بەباشە ناوی دەبەن، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێ،

وەگەرنا خزمەتی ئەو شوێنە دەکاتو بەیادی خوا ئاوەدانی دەکاتەوەو کاروبارەکانی دەبات بەڕێوە یان لەخێردا خەڵکی بەیەکەوە دەبەستێ لەسەر گوێڕایەڵی یان تەوبەدەکات بۆلای خوا لەوەی کردوویەتی یاخود ڕێنومایی دەکرێ بۆ لای ئیسلامو بەشەهیدی دەمرێ ئەوەش دەبێ، بەکۆشکەکەی لەبەهەشتدا ئەمەش لەکاتێکدا ئەگەر مزگەوتەکە بەوچەشنە دروستکرا کەشیاوە بەڵام ئەگەر بەچەشنێ دروستیکرد وانەدەبوو یاخود دوانگەکەی لاربوو یاخود رووبەجێگەیەکیتربوو بەڵگەیە لەسەر واژووی خێر بەشەڕ.

*ئەگەربینی مزگەوتێك دروستدەکات یاخود خەڵوەتگەیەك لەئایندا شارەزا دەبێ یاخود ئەو ساڵە(حەج)دەکات یان شتێك دروستدەکات وەك حەمام یان ئوتێل یا فرۆشگاو شتیتر.

*ئەگەربینی سەقفی مزگەوت تێکدەدات هەتیوی بێدەرەتان دەژیەنێت، ئەگەر مزگەوتەکەی گەورەکرد لەئایندا خێر ئەنجامدەدات یا کرداری چاکە یاخود تەوبە یان رەوشتی بەرزو جوانو بەویژدانەوە لەگەڵ خودی خۆیدا دەدوێ.

*ئەگەر خۆی لەمزگەوتێکی نوێدا بینیەوە نەیبینیبوو ئەوساڵە (حەج)دەکات یاخود شارەزا دەبێت لەئاینی خودایا، ئەگەر فرۆشگاکەیبوو بەمزگەوت یان مزگەوتەکەی بوو بەفرۆشگا بەڵگەیە لەسەر کاروکاسبی حەلاڵ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرئەوەی حەلاڵو حەرام بەیەکەوە تێکەڵدەکات.

*مزگەوتی وێرانەو بێنوێژخوێن بەڵگەیە لەسەر فەرامۆشکردنی زانایانو پووچەڵکردنەوەی فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر دنیانەویستانی خۆدابڕ لەدنیاو ئەوەی لەدەستیاندایە.

*بینینی هەموو مزگەوتێك بەڵگەیە لەسەر رووگەو شوێنەکەی وەك مزگەوتی (ئەقصا)و (حەرام)و (دمشق)و (میسر)و هاوچەشنی ئەوانە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانایانی هاورێباز یاخود نوێنەرانی پادشاکانیان، ئەگەربینی لەدەرگای مزگەوتەوە چووە ژوورەوەو کڕنووشی برد تەوبەی پێدەدرێ بەپێی ئایەتی: ﴿وادخلوا الباب سُجداً وقولا حطة نغفر لكم خطاياكم﴾(البقرة: ٥٨).

*ئەگەربینی گەیشتوتە نێو مزگەوت بەلاّم بەداخراوی بینیویەتی پاشان بۆیکرایەوە هاوکاری پیاوێکدەکات لەقەرزێکدا کەلەسەریەتیو قوتاریدەکات لێیو ناوبانگی باش لای خەڵکی دەردەکات.

*ئەگەربینی چوە نێو مزگەوت بەسواری رایەڵەی خزمایەتی دەپچڕێنیّ.

*ئەگەربینی لەمزگەوتێکدا دەمریّ لەسەر تەوبەیەکی پەسەندو قبولّ دەمریّ.

*ئەگەربینی حەسیری مزگەوتێك دڕاو پوکایەوە خانەوادەکەی دوای چاکی خراپدەبن.

*دروستکردنی مزگەوت بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا بەپێی ئایەتی: ﴿قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِداً﴾ (الكهف:٢١).

*چوونە نێو مزگەوتی (حرام) بۆ ئەوەی ژن دیاریدەکات بەڵگەیە لەسەر چوونە نێو ماڵی دەزگیرانەی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی لەترس‌وبیمو راستگۆیی لەبەڵێندا.

**مزگەوتی شار:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: مزگەوتی شار بەڵگەیە لەسەر خەڵکەکەیو بەرزاییەکەی سەرکردەکانیەتیو نزماییەکەشی رەشە خەڵکە ، ناوەڕاستەکەشی خەڵکی یادوزیکرکارە، دوانگەکەشی پێشەواو ئیمامی خەڵکە، گڵۆپو چراکانیشی زانایانو خێرۆمەندو تێکۆشەرو پارێزەرانیەتی.

*حەسیرەکانیشی خەڵکی خێرۆمەندو چاکەکارە لەگەڵ ئەوەی تێدا کۆدەبێتەوەو نوێژی تیا دەکات.

*منارەی مزگەوت دادوەری شارە یان زاناکەیەتی بانگەوازی خەڵکیدەکاتو رازین بەوتەکانیو بەپێی رێنوماییەکانی دەچن بەڕێوەو پەیرەوی بڕیارەکانیدەکەن، هەروەها دوعای قبولّو گیرایە.

*دەرگاکانی کرێکارو ئەمیندارانە، لەگەڵ هەرکەسێك بەرگریو پارێزگاریی لەخەڵکیدەکات.

(نابلسی)دەڵێت: مزگەوتی شار لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+پادشاو فەرمانڕەوا بەهۆی بەڕێوەبردنی کاروباری ئاینو راگری حەقو رێگری حەرام.

+بازاڕێـك خـەڵكی ڕووی تێـدەكاتو سوودو خێری لێدەكەن بەپێی هەوڵو تێكۆشان.
+هەركەسێك پێویست بێت گوێڕایەڵی لەباوكو مامۆستاو زانا.
+دادپـەروەری بۆئـەوەی سـتەمی لێدەكرێتو ڕوودەكاتە مزگەوت.
+قورئانی پیرۆز.
+دەریا.
+حەمام كەشوێنی خۆپاككردنەوەیە.
+گۆڕستان شوێنی ملكەچییە.
+خۆشتن.
+چاكەكردن.
+پزیشكی.
+بێدەنگی.
+ڕووكردنە قیبلە.
+ئـەوەی پـەنای پێـدەگیرێت دژ بەدوژمنان وەك قەڵای پتەوو...
*سـەربانیش تایبـەتی پادشـاو فەرمانڕەوایـە، لەگـەڵ ئەوانـەی بەدیدەكـەن، درێژكردنـەوەش گـەورە پیاوانی وڵاتەو چراكانیشی گەنجینەیە لەگـەڵ ئـەوماڵو داراییـەی مزگـەوتی پێچـوانو ڕازاوە دەكرێـتو لـەپێناوی خوداوەنـدا دەبەخـشرێ، حەسـیرە ڕاخراوەكانیش دادپەروەرییەتی لەگەڵ ئەوزانایانـەی لـەژێر فەرمانڕەواییـدانو

دەرگاكانیـشی پەردەكانیـەتیو منارەكـەی جێگرەكانیـەتی یـان هەواڵگرە.
*ئەگـەر بەڵگەبوو لەسـەر فـەرمانڕەوا كۆڵەكـەكانی كـاتو دادەو چراكانیـشی پیاوچـاكەو زاناكـانی سـەردەمە، حەسـیرو ڕاخـەرەكانی بڵاوبوونـەوەی حـوكمو فەرمانڕەواییـەتی، سـەربانو سـەقفەكەی ئـەو كتێبانەیـە لـەكاتی پێویستدا بۆیاندەگەڕێتەوە، دوانگەكەی بەندەیـــەو میحرابەكەشـــی هاوسەرەكەیەتی.
*هـەروەها دەگونجێـت میحرابەكـەی بەڵگەبێت لەسەر ڕزقو ڕۆزی حەڵاڵ یان هاوسەری چاكوباش.
*منـارەش وەزیـرو پێـشەوای دادپەروەرە.
*دەگونجێت منـارە بەڵگەبێت لەسـەر بانگبێـژان، قورئانـەكانیش بەڵگـەبێت لەسەر قورئـانخوێنو دوانگەش لەسـەر وتاربێـژان، دەرگاكـان لەسـەر دەرگـاوانو، بەرپرسیـشی بەڵگـەبێت لەسەر چراو ڕووناكی نێو مزگەوت.
*ئـەو مزگەوتانـەی بەرپرسـانی موسـوڵمانان ڕووی تێدەكـەن لـەكاتی سەفەر یان جەژنەكاندا بەڵگەیە لەسـەر دروسـتكردنی بـۆ بـەجێهێنانی

ڕێوڕەسمەکانی ئاینو بەرزکردنەوەی وتەو بڕیاری موسوڵمانانو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا، ئەگەر سووتاو کەوتەبەر تەوژمی با بەڵگەیە لەسەر خاوەنەکەی حوکمو فەرمانڕەوایی دەگۆڕێتو حوکمەکەشی لەکاتی لێکدانەوەدا حوکمی ئەو ڕارەوانەیە کەپێدا تێدەپەڕن.

**م ژ**

**مژین:** (نابلسی)دەڵێت: مژین بردنی ماڵوسامانە، ئەگەر مەمکەکانی مژی ماڵو پارە لەژنەکەی وەردەگرێ، هەروەها هەموو ئەندامێك بەڵگەیە لەسەر کەسێکی نزیك.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی لەخەودا مرۆڤێك دەیمژێ ماڵوسامانی لێوەردەگرێ.

*ئەگەر ڕانی مژی ماڵوسامان لەتیرەو هۆزو خانەوادەکەی وەردەگرێ.

**م س**

**مسگەر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: خاوەنی دەیەکە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی ماڵوسامان بەدەستدەهێنێ لای جوولەکەو مەسیحیەکانەوە.

*ئەگەر شتێکی لەدەستیدا بینی با ئاگاداربێت لەکەسانێك دژایەتی دەکەن.

*ئەگەر مسگەرێکی بینی بوختانو درۆو جنێو دەدات.

**م ش**

**مشار:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر دادوەرو ئەوەی نێوانی دوو لایەنی جیاواز یەکلاییدەکاتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کشانەوە یان شوێنی دووپووانو پلانەکانیان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرگیری.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پیاوێك ببەخشێو چاوپۆشی بکات.

(نابلسی)دەڵێت: پیاوێکە دەباتو دەیدات، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاوسەرگیریی یان شەڕ، مشار هێزو پشتگیریو ڕنقو ڕۆزییە.

*مشاری ئاسایی پیاوێکی زانایەو مشاری داربڕینەوەش پیاوێکە ڕەش پێستەکان دەچەوسێنێتەوە.

*مشاری مەڕمەڕ بەڵگەیە لەسەر کۆشك.

*مشاری داری ئەستوورو ڕەق بەڵگەیە لەسەر خەڵکی نەخوێندەوارو هاوچەشنەکانیان.

**مشتومڕ:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا هیچ خێرێکی تیانییەو دەستنوێژ دەشکێنێو لەگەڵ پەیمان مەگەر مشتومڕ لەسەر شتێکی خراپبکات یان بانگەشەی چاکسازی.

**مشك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ژنێکی خراپەکارە یان دزە یاخود رابردوویەکی خراپی هەیە، ئەگەر کۆمەڵبوو رەنگەکانی جیاوازبوون رەش‌و سپی شەوگارو رۆژگارە.

*جرج هیچ خێرێکی تێدا نییە، هەروەها دەڵێن: دزێکی لێهاتوو کارامەیە.

*هەروەها دەڵێن: مشك بەڵگەیە لەسەر منداڵو بەردەستە.

*هاتنەدەرەوەی مشك لەماڵ بەسەرچوونی نازو نیعمەتە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین) دەڵێت: لەخەودا بینیم لەگەڵ مشکێکدا جووتبووم لەپاشی دەنکە خورمایەك هاتەدەرەوە، (ئیبن سیرین) وتی: تۆ ژنێکی بەدکارت هەیە؟ وتی: بەڵێ، وتی: کوڕێکی چاکت لەو ژنە دەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بوو بەخاوەنی مشك دەبێت بەخاوەنی خزمەتکار چونکە مشك لەخۆراکی مرۆڤ دەخوات‌و خزمەتکاریش لەمی گەورەکەی.

(دمیری) دەڵێت: کۆتری کێوی بەڵگەیە لەسەر خواناسان‌و گۆشەگیری بۆ زیکرو یادو خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ ﴾ (الإسراء:٤٤)

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر گۆرانی بێژو گۆرانی‌و سەما یان هاوسەرو خزمەتکار.

*ئەگەر بینی مشکێك لەماڵەکەیدا یاریدەکات فەرەوپیت بەدەستدەهێنێ لەوساڵەدا چونکە یاریکردن دوای تێری دروستدەبێ.

*مشکی سپی‌و رەش بەڵگەیە لەسەر شەوو رۆژ، ئەگەر لەخەودا بینی بەرۆژ دێت‌و دەچێت بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی.

*ئەگەر بینی کراسەکەی کون کونکرد لەپێناوی ئەودا تێپەڕیوەو ئاشکرایدەکات.

*ئەگەر مشکێکی بینی چاڵیهەڵدەکەن دزێکی کونکاری گیرفانبڕە.

*مشك گەڕییە ئەگەر رەنگی جیاواز جیاواز نەبێ.

*ئەگەر مشکێکی رەش‌و سپی بینی هاتوچوو تەمەنیدرێژدەبێ سپییەکان رۆژەو رەشەکانیش شەوە.

* هەروەها دەڵێن: مشك خانەوادەو ماڵو منداڵە.
* ئەگەر بینی مشکێك دەکوژێت زەفەر بەژنێکی داوێنپیس دەبات.
* ئەگەر بینی بەرد یان رمێك یاخود گوللەیەکی دەگرێتە مشکێك غەیبەتی ژنێکی خراپدەکات یان بەخراپە نامەی بۆ دەنێرێ.
* ئەگەر کۆمەڵێ مشکی زۆری بینی سپیو رەش لەیەك شوێندا لەسەر لابوون یان دەردەکەوتن بەتەواوی لەنێو بیرێکدا کەموکوڕی تەمەنیەتی.
* ئەگەر بینی مشکێك لەلووتی هاتەدەرەوە یاخود لەعەورەتی کچێکی خراپەکاریدەبێت، ئەگەر لەپاشی هاتەدەرەوە ژنێکی بێخێری لێدێتەدەرەوە.
* ئەگەر لەماڵی خۆیدا چەندین مشکی بینی ژنانی بێخێر رووی تێدەکات.
* ئەگەر لەنێوجلەکانی یاخود لەسەر جێگەکەی مشکی بینی ژنێك تێکەڵیدەبێت کەهیچ خێرێکی تێدا نییە.
* ئەگەر پێستی مشکێکی بەدەستهێنا ماڵێکی کەم لەژنێکی خراپ بەدەستدەهێنێ.

م ق

**مقەست:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پیاوێکە شت دابەشدەکات، ئەگەر مقەستێکی بەدەستیەوە بینی لەبەریەرەکانیدا پێویستی بەدادوەر دەبێ.
* مقەست کوڕێکی پیاوچاکە لەنێوان خەڵکیدا.

(قەیرەوانی)دەڵێت: ئەگەر مقەستێکی بەدەستیەوەبینی ئەگەر کوڕی هەبوو کوڕێکی تریدەبێت، بۆ خزمەتکار بەهەمان شێوازە، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ.
* ئەگەر لەئاسمانەوە مقەستێکی بۆکەوتەخوارەوە لەکاتی نەخۆشیو بەلادا قەرزدەکات، بەلام ئەگەربینی بەمقەست خوریو پێستەو موودەبڕێ لەپشتی ئاژەڵێك بەهۆی گوتنی شیعرو هۆنراوەوە پارەو سامان کۆدەکاتەوە یاخود بەداوا بەدەستیدەهێنێت، بەلام ئەگەر ریشی خەڵکی بەو مقەستەبڕیو جلەکانی کەرتکەرتکردن پیاوێکی ناپاکە یاخود غەیبەتدەکات.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئابروو بردنو نکوولی لێکرتن.
* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەرپرسێك حەقو ناحەق لەیەك جیابکاتەوە.

*بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی منداڵو خزمەتکار.
*ئەگەربینی لەئاسمانەوە مقەستێکی بۆدابەزی تەمەنی بەسەردەچێت.
*ئەگەر بەمقەست ریشی خەڵکی بڕی یان جلوبەرگەکانیان غەیبەتو ناپاکیتان لەگەڵدا دەکات.
*هەروەها گوتراوە: مقەست بەڵگەیە لەسەر دوو هاوەڵ کەرێککەوتوون لەگەڵ یەك.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بەدەستی یەکێکەوە بینرا لەدایکەوە برایەکی دەبێت.
*ئەگەر مقەستێکی بەدەستیەوە بینی خوری پێدەبڕی ماڵوسامانێکی زۆر کۆدەکاتەوە.
*ئەگەر مقەستی بەدەستیەوە دی لەشەڕو ئاژاوەدا ناچار دەبێت بچێتە بەردەستی دادوەر.
*هەروەها دەڵێن: پیاوێکی چاکەکارە لەنێوان خەڵکیدا.

## م ل

**ملکەچی( سەرشۆڕی )**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر هەڵسان بەکاری خراپو لادان لەقورئانو سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ).

**ملوانکە( زریزە )**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: ملوانکەو زنجیر بۆ ژنان جوانیو شۆخو شەنگیانە لەگەڵ هیواو ئارەزوویان.
*ملوانکەی داڕێژراو لەدووڕوگەوهەر ترسانە لەگەڵ قورئان لەبەرکردن بەپێی بچووکی گەوهەرو جوانیو زۆریی.
*ئەگەر ملوانکەیەکی زێڕیی لەملی خۆیدا بینی کارێکی موسوڵمانانی پێدەسپێردرێ یاخود ئەمانەتێك.
*گەوهەر لەملوانکەدا یان شیلانەی نێوی ناوەڕۆکیو کۆتاییەکەیەتی.
*ملوانکە بۆ پیاوان ئەگەر پارەی زیوینی لەگەڵبوو بەڵگەی هاوسەرگیرییە لەگەڵ ژنێکی شۆخو شەنگدا، بوونی یاقووتو گەوهەریش جوانییەتی، ئەگەر لەزیوبوو دەستەڵاتو پارەداریو خۆشحاڵییە، ئەگەر لەئاسنبوو دەستەڵاتو توندوتیژییە، ئەگەر لەزێڕێکی پاكو پوختبوو خۆشیەکانی دنیایە، ئەگەر درایە پاڵ ژن ژنێکی خراپە .
*ملوانکە بۆ ژن ماڵو سامانێکە مێردەکەی لای ئەو ئەسپەردەیکردووە.
*هەندێکدەڵێن: ئەو جوانییەی ژنان لەگەردنیاندا هەڵیدەگرن بەڵگەیە لەسەر هاوسەرو کوڕەکانیان، بەلام بۆ

پیاوان هاوچەشنی ئەو خەوە بەڵگەیە لەسەر ناپاکیو ئاڵۆزبوونی هۆکارەکان. (نابلسی) دەڵێت: ملوانکە بۆ دووگیان کورە، ئەگەر بچرا یان شکا دەستەڵاتدار لادەبرێ.

* ملوانکەی سوور بۆ ژن دەمامکێکی سوورە، بۆژنی هاوسەردار کورەو بۆ رەبەنیش مێردە.

* ئەگەر چەند ملوانکەیەکی بەملی خۆیەوە بینیو نەیدەتوانی هەڵیبگرێ ناتوانێ کردار ئەنجامبدات.

* ئەگەر ژنێك بینی ملوانکەیەکی لەملدایەو ئەو چاکییەی تێدایە یان خراپ لێکدانەوەکەی دەدرێتە پاڵ مێردو بژێوی پەیداکاری یان ئەمانەتپارێزیدەکات.

**ملو گەردن:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەرنەوەی سنگو گەردنی پێدەبەسترێ، هەروەها (ئیبن سیرین) دەڵێت: رێکخستنی کاروبارە.

**م ن**

**منارە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: منارە پیاوێکە خەڵکی لەسەر خێرکۆدەکاتەوە، رووخانی منارەی مزگەوت مەرگی ئەو پیاوەیە لەگەڵ سستی باسو خواسیو پەرتەوازبوونی نوێژخوێنانی مزگەوتەکە.

* منارەی مزگەوت خاوەن پۆستە یان پیاوێکە خەڵکی بانگدەکات بۆ لای ئاینی خوا.

* ئەگەربینی مناڵێکی کەوتە نێو بیرێکەوە توانا و دەستەڵاتی بەسەردەچێتو خەونەکەی بەڵگەیە لەسەرئەوەی ژنێکی زماندرێژدەهێنێو وێرای ئەوەی ژنێکی بەدینو شۆخو شەنگی هەیە.

* ئەندازیارێك بینی سەرکەوت بەسەر منارەیەکی مەزندا لەدار دروستکرابوو پاشان بانگی لێوەیدا، خەونەکەی بۆ راڤەکارێکی خەو گێڕایەوە، ئەویش وتی: دەستەڵات بەدەستدەهێنێت لەگەڵ پلەوپایەی بەرز بەدووپوویی.

* دەگێڕنەوە (قەعقاع) دەهەزار درهەم قەرزاربوو غەمو پەژارە رووی تێکرد لەخەوەکەیدا باوکی لەسەر لێواری منارەیەك بینی یادوزیکری خودای دەکرد، کاتێ بینی بانگیکرد پاشان بەئاگاهات، ئنجا لەراڤەکارێکی خەوی پرسی، ئەویش بەم چەشنە بۆی لێکدایەوە: منارەکە پلەوپایەو شکۆمەندییە باوکت بەدەستی دەهێنێت، ئەویش وتی: باوکم مردوە، راڤەکاری خەو وتی: تۆ کوڕی باوکی خۆت نیت؟ وتی: بەڵێ، وتی: دەگونجێت تۆ ببیت بەزانا یان میرێك،

یادو زیكری خوداش ئەوەیە تۆ لەغەمو پەژارەدایتو خوداوەند دەرووی خێرت لێدەكاتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿فَنَادَىٰ فِي الظُّلُمَاتِ أَن لَّا إِلَٰهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾(الانبیاء:٨٧). ئەوەندەی بەسەرا رانەبورد پیاوێك هات دەستیگرتو وتی: تۆ (قعقاع)ی ؟ لەنەفسی خۆیدا وتی: ئەمە قەرزارێكە لێم نابێتەوە، بەلام ئەو وتی: (سەعدانە) ژنێكی نەخۆشەو بانگدەكات، كاتێ چوو لەگەلی كۆمەلێ ریش سپی دانیشتبوو نوسراوێك نووسرابوو بەم شێوەیە (سەعدانە) سێیەكی مالەكەی دەدات بە(قعقاع) دوای سێ رۆژ ئەو ژنە مرد.

**منداڵ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بینینی بەلگەیە لەسەر غەمو پەژارەو ماندوبوونو چاودێریو دلراگرتنی نەزانو ئارەزووبازان.

*ئەگەر كچۆلەیەكی بچووكی هەلگرت ئەگەر زیندانی یا گەمارۆ درابوو یاخود ماندوبوو بەهۆی كێشەو هەژارییەوە دەرووی لێدەكرێتەوەو دلخۆشدەكرێ، ئەگەر لەهیچكام لەوحالانەدا نەبوو كچۆلەكە غەمو پەژارەیە ئەگەر ژنێكی نەخۆشبوو دەرووی لێدەكرێتەوە مەگەر لەدەمەوەببینێ ئەوجا بەلگەیە لەسەر مەرگو تیاچوون.

(ئیبن سیرین) دەلێت: منداڵ لەخەودا دوژمنێكی لاوازە هاوەلایەتی دەردەخات پاشان دژایەتی.

*ئەگەر پیاوێك بینی بوە بەمنداڵ پیاوەتی بەسەر دەچێت ئەوكات خەونەكەی بەلگەیە لەسەر دەرووی خێر لێكردنەوە.

*ئەگەر بینی منداڵێك هەلدەگرێ كارێك رێكدەخات.

*ئەگەر بینی لەقورئان یان كتێبی ئەدەب فێردەبێت لەگوناهو تاوان تەوبەدەكات.

*ئەگەر بینی كۆمەلێك منداڵیبوو خەونەكەی غەمو پەژارەی تووشدەبێ چونكە منداڵ ناتوانێ پەروەردەبكرێ بەچەشتنی ئێشوئازار نەبێ.

*هەروەها دەلێن: ئەوەی ببینێ منداڵێكی بچوكی بوە زیادەیەكە پێیدەگات یان نازو نیعمەت یاخود غەمو پەژارەیە.

*هەروەها دەلێن: منداڵی بچووك بەلگەیە لەسەر غەمو پەژارەی كەم.

*كچی بچووك لەخەودا فەرپیتو قوتاربوونو ئاسانییە دوای نارەحەتی.

*ئەگـەر بینی منـداڵێکی کرپـوە غەمو پـەژارە دێـت بەسـەریا، ئەگـەر کچێکی هێنا خێر رووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی جلوبەرگێکی ئەرخەوانی درا بەسـەریا هاوسـەردەگرێ لەگـەڵ ژنێکی رەچەڵەك پاكو پوخت.

*ئەگەر خـەوێکی لەوچەشنەی بینی خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر بـاڵغبوونی کوڕەکـەی، ئەگـەر بـەپیری بینی خەوەکەی بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*ئەگـەر بینـی کوڕەکـەی گونـاهو تـاوانێکی ئەنجامـداوە بـەنهێنی ئابرووی دەچێت.

*ئەگـەر بینـی کـوڕێکی بـاڵغی بەدەستهێنا مەزنیو شکۆو هێزە بۆیو دایکیشی لەلێکدانـەوەدا لەپێشترە لەباوکی.

*ئەگـەر ژنێك منـداڵێکی نێرەمـووکی بینی خێرێکە دەیکات بەپێی باشی یان خراپی.

*هـەروەها دەڵێن: ئـەوەی ببینـێ کـوڕێکی بـچووکی هەیـەو بینـی بـوە بەپیاو بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*هەروەها دەڵێن: ئەو منداڵەی بگات بە پیاو بەڵگەیە لەسەر بـەهێزکردنو یارمەتی.

*ئەگـەر لەخـەودا بینـی کوڕییـەوەو ژنەکـەی دووگیـانبوو کـچی دەبێـتو بەپێچەوانەشەوە.

*دەگێڕنـەوە ژنێـك لـە(مەککـە) قورئـانخوێنبوەو لەخـەودا دەبینـێ لـەدەوری (کابـە) خزمـەتکاری لێیـەو رێحانـەیان بەدەستەوەگرتووەو رەنگی جۆراو جۆری هەیـەو دەڵـێ: بێگـەردیو پـاکی بـۆ خـوا چـۆن ئـەوە لـەدەوری (کابـە)یە. ئنجا پێیدەڵێ: نـەتزانیوە (عەبدولعـەزیزی کـوڕی ئـەبی داود) ئەمشەو ژنیهێناوەو بۆبەیانی مردوە.

*ئەگـەر بینـی بـوە بەمنداڵ نـەزانیو نەفامی دەردەبڕێ.

(نابلسی) دەڵێـت: لەخـەودا غـەمو پەژارەیە ئەگەر منداڵێکیبوو بـەباوەش هەڵیدەگرێ، منداڵی هەرزە مژدەیە.

*ئەگەر ئەو وڵاتە گەمارۆدرابوو خەڵکی لەناڕەحەتیدابوونو بینـی منـداڵێکی جوانکیلـە خـۆیکرد بەشـاردا یـان لـەئاسمان دابـەزی یـاخود لەزەویهاتـە دەرەوە مـژدەو دەرووی خێـرە بـۆ خەڵکی ئەو شوێنە.

*منداڵی باڵغ هێزو شکۆمەندییە.

*ئەگـەر بینـی منداڵێکـەو لەقوتابخانـە فێری قورئـان دەبێـت تەوبـە دەکـات یـاخود لەشـکۆمەندییەوە دەچێت بـۆ سووکیو رسوایی.

*ئەگەر بینی بوە بەمناڵێکی لوسکەو بێمووو میراتیەکی لەدایکەوە بۆ دەمێنێتەوە.

*ئەگەر هەژارێك بینی بوە بەمنداڵ رزق‌وڕۆزی‌و دەوڵەمەندی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر لاوێك بینی بوە بەمنداڵ باش نییە.

*ئەگەر نەخۆشێك بینی بوە بەمنداڵ دەمرێت.

*ئەوەی خۆی بەمنداڵی ببینیّ‌و دادگایی هەبێت دەدۆڕیّ‌و شکستدەخوات.

*ئەگەر رووخساری خۆی لەئاوێنەدا بەمنداڵی ببینیّ‌و ژنەکەی دووگیانبێت ژنەکەی کوڕێکی دەبێت لەخۆیدەچێت.

*لەباوشەکردنی منداڵی بچووك غەم‌و پەژارەیە، ئەگەر منداڵەکە نێرینەبوو دەرەنجامەکەی باشە، بەلاّم ئەگەر مێینەبوو خراپە.

*منداڵی بچووك لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر تاوان‌و خوداوەند دەفەرموێت: ﴿ سَيُصِيبُ الَّذِينَ أَجْرَمُوا صَغَارٌ عِندَ اللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ (الأنعام:١٢٤).

*دەگونجێت بینینیان بەڵگەبێت لەسەر شاییی‌و خۆشی‌و جوانکاری.

*دەگونجێت بینیان ئەگەر منداڵی خەوبینیەربوون بەڵگەبێت لەسەر فیتنەو گۆڕان بەپارە.

*دەگونجێت بینینی منداڵی بچووك بەڵگەبێت لەسەر دەستبەرداربوون بەڕازیبوون بەکەمترین جۆری بژێوی.

*دەگونجێت کوشتنی منداڵ لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر زانیاری زۆروفراوانی بەهۆی چیرۆکی (خضر) (سەلامی خوای لێبێت) ئەگەر کوڕیان تێدابوو بینیان بەڵگەیە لەسەر ماڵ‌و سامان‌و هاوسەرو زۆری خێر.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا مژدەیە بۆ یەکێك بەدیبکات ﴿ يَا بُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَامٌ﴾ (یوسف: ١٩).

*ئەگەر بینی کوڕێکی هەبوو غەم‌وپەژارە یان نەخۆشی رووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی کچیبوو دەرووی لێدەکرێتەوە.

*ئەگەر منداڵێکی بچووکی هەڵگرت غەم‌و پەژارە بەدەستدەهێنیّ.

*ئەگەر ژنێکی دووگیان کوڕێکیبوو مژدەی کچی پێدەدریّ‌و بەپێچەوانەشەوە.

**منـــــدالى دۆزراوه( بيكـــــهس )**: (نابلسى)دهڵێت: بهڵگهیه لهسهر دوژمن بهپێى ئایهتى: ﴿فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾ (القصص:٨).

* دهگونجێــت بهڵگــهبێت لهســهر كۆڵهكـهى شــتو رهواندنــهوهى غــهمو پــهژاره بــهپێى ئایــهتى: ﴿فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ﴾ (القصص:١٣) ﴿فَرَجَعْنَاكَ إِلَى أُمِّكَ﴾ (طه:٤٠).

## م و

**موزدهلیفـه**: (نابلسى)دهڵێت: ئهگـهر خۆى تێدا بینییـهوه پیاههڵدانى بـاش بهدهســتدههێنێ بــههۆى ههوڵــدانى لهخواپهرســـــتىو گوێڕایهڵیـــــداو دهگونجێت ئـهو قـهرزهى لهسـهریهتى بیداتــهوه یــان بــهڵێنو پهیمانهكــهى بهجێبكهیهنێت.

**موسى( سهلامى خـواى لێبێـت )**: (ئـیبن سـیرین)دهڵێــت: ئهگــهر (موســى)و (هــارون)ى بینــى یــاخود یــهكێكمیانى بینى لهسهردهستى ئـهودا ستهمكارێك تیادهچێت، ئهگـهر بـهدیكردن خۆیـان ئامــادهى جــهنگكردبوو ســهركهوتن بهدهستدههێنێت.

(نابلسـى)دهڵێـت: ئهگــهر (موســى)ى بینى پهروهردگار لهسهردهستى ئـهودا ســتهمكارێك لــهناو دهبــاتو پاشــان شـــــكۆمهندىو ســـــهركهوتن بهدهسـتدههێنێتو هــهرگیز ملكهچـىو رسوایى رووى تێناكات.

* بینینــى (موســى) (ســهلامى خــواى لێبێـت) بهڵگهیـه لهسـهر هێـزى حـهقو راســتىو زاڵبــوون بهســهر ناحهقانــدا، ئهگــهر پادشــایهكى ســتهمكار یــان ســهرۆكى زندیقــهكانبوو خوداوهنــد تیایـدهباتو لهشـهڕو خراپـهى قوتــار دهبێت.

* ئهگـهربینى چـوهته سـهر كێوهكـهى (موسى) یاخود جلوبهرگێكى پۆشـیوه ئهگـهر دهسـتهڵاتدارو دوژمنداریـشبوو زاڵدهبێت بهسهر دوژمنهكانیداو دهگـات بههیواو ئاواتى خۆى، ئهگهر زیندانیـهك بینـى یـاخود كهسـێك لـهدهریادا پـهكى كهوتبوو بهڵگهیـه لهسـهر قوتـاربوونى، ئهگــهر كهســێك بینــى لهجهنگــدابوو سهردهكهوێت.

* ئهگـهر (موسـى)ى بینـى زاڵـدهبێت بهسهر بارودۆخى خۆیـدا بـهڵام لهلایـهن كهســهكانیهوه غــهمو پــهژاره رووى تێدهكات، ئهگهر موسافیرو گهشتیاربوو لهدهریادا سهلامهتو قوتاردهبێت.

* بینینی (موسی)(سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەیە لەسەر تاقیکردنەوە لەمنداڵیدا یان جیابوونەوەی خزم و کەس و کارو لەئامێزوگرتنی لەلایەن کەسانی بێگانەوەو تێکەڵبوون لەگەڵ پادشا ستەمکارەکان و بەجێهێنانی بەڵێن و پەیمان و بوون بەزاوای پیاوچاکان و شارەزابوون لەکاری سەرسورهێنەر.

* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر سەفەر لەدەریاداو دەرەنجامەکەشی بەخێرو سوود کۆتایی بێت، دەگونجێت دەربارەی ئابرووی قسەیەك بکرێ بەوچەشنەبێت.

* ئەگەر خواناسێك (موسی)یان بینی بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی نوری نێوناخی و بەدەستهێنانی پلەوپایەی بەرزوبڵند.

* ئەگەر ژنێك (موسی)ی بینی دەترسێ کوڕەکەی تیابچێت یاخود نەهامەتیەك رووی تێبکات و بەخراپ چارەنووسی کۆتایی بێت، بەهەمان شێوەیە چەشن بۆ یەکێك (موسی) ببینێ لەمناڵان.

* ئەگەر گۆچانەکەی (موسی) ی بینی بەدەستیەوە پلەوپایەیەکی مەزن بەدەستدەهێنێ لەگەڵ سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا ئەگەر جادووی لێکرابوو پووچ و بەتاڵدەبێتەوە.

* دەگونجێت دەرکەوتنی گۆچانی (موسی) بەڵگەبێت لەسەر سەرکەوتنی باوەڕداران و تیاچوونی بێباوەڕان.

**موسوڵمان بوونی مرۆڤ لەخەودا:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەر هاوەڵ پەیداکەرێك لەخەودا خۆی یان یەکێکی دی ببینێ لەبەهەشتدایە یان لەسەر سینی زیوە موسوڵماندەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِنْ فِضَّةٍ﴾ (الإنسان:٢١).

* بەهەمان شێواز ئەگەر ببینێ دەچێتە نێو قەلایەك ، دەگێرنەوە لەپێغەمبەروە (ﷺ) دەفەرموێت: "پەروەردگار دەفەرموێت: هیچ پەروەردگارێك نییە بەدەر لەمن، بەرزوشکۆمەندبێت قەلای من، ئەوەی بچێتە نێوی دڵنیا دەبێت لەسزای من".

* ئەگەر هاوەڵ پەیداکارێك (موشریك) ببینێ موسوڵمانبوە یاخود روو بەرووی(قیبلە) نوێژدەکات یاخود ببینێ سوپاسی خودا دەکات رێنموونیکراوە بۆ لای ئیسلام ، ئەگەر لەلانەی ناموسوڵمانیدا بێت و لەخەودا ببینێ روو بەلانەی ئیسلام رووی وەرگێڕاوە دەمرێت بەخێرایی چونکە

لای ئیسلام شوێنو جێگە حەقو ڕاستییە.
* ئەگەر موسوڵمانێك ببینێ لەخەودا وەك ئەوەی بڵێت: موسوڵمانبووم کاروبارەکانی ڕێکدەبنو دڵسۆزی پتەوو قایم دەبێت.
* ئەگەر موسوڵمانێك ببینێ بۆ جاری دووەم موسوڵمان دەبێت لەبەڵاو نەهامەتی پارێزراو دەبێت.
* ئەو هاوەڵ پەیداکارەشی ببینێ مردوە، پاشان زیندو دەبێتەوە موسوڵماندەبێت، بەهەمان شێوە ئەگەر خۆی لەکەشتیەکدا لەنێو دەریادا ببینێ موسوڵماندەبێت.
(نابلسی)دەڵێت: بریتییە لەسەقامگیربوونی ئاین ، هەموو هاوەڵ پەیداکەرێکە گەر لەخەودا ببینێ یاخود یەکێکیتر ببینێ لەبەهەشتدایە یان بازنی زیوی پێدراوە موسوڵماندەبێت، ئەوەی شایەتومان بەزاریا بێت لەخەڵکی ناموسوڵمانی ژێر بەیداخی موسوڵمانان لەنارەحەتی قوتار دەبێتو ڕێنموونی دەکرێت دوای سەرگەردانی ئەگەر دوودڵ بێت، خۆئەگەر بەزۆر وای لێکرابێت دەکەوێتە کارێکەوە کەخۆی لێی پاراستوە، بەلام ئەگەر پاشگەزبوبوەوەو لەخەودا شایەتومان بەدەمیا هات دەگەڕێتەوە بۆ لای دایكو باوکی یان بۆ ئەو شوێنەی کۆچی لێکردوە یان بۆ ئەو هۆکارەی ئەنجامیداوە، ئەگەر موسوڵمانبوو بەڕاستگۆییو حەقبێژی ناوبانگ دەردەکات.

**موشتەری:** (نابلسی)دەڵێت: خاوەنی گەنجینەی فەرمانڕەواو پادشاییە.
* بینینی موشتەری لەگەڵ مانگ بەڵگەیە لەسەر :
+ماڵ.
+کڕین.
+ڕزقوڕۆزی.
+پلەوپایەی بەرز.
* ئەگەر لەگەڵ مانگدابوو نزمبوو یان سووتابوو بەڵگەیە لەسەر قورئانخوێندن یان تۆڵەسەندن یاخود کۆڕی دانیشتنو فەرموودەو خەولێکدەرەوەو نوێژو ڕۆژوو بەندایەتیو (حەج).

## م وو

**مووبڕ(قژبڕ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: مووبڕ پیاوێکە زەرەر بەدەوڵەمەند دەگەیەنێتو سوود بەهەژاران.
(نابلسی)دەڵێت: بینینی مووبڕەوە بەڵگەیە لەسەر پۆلیس ماڵودارایی خەڵکی بەشەڕو ئاژاوە دەستبەسەرا

دەگرێت، ئەگەر لەخەودا مووی ئاژەڵی بڕیەوە بەڵگەیە لەسەر خێروچاکەو پشوودان بەو ئاژەڵە یان بەخاوەنەکەی، وەگەرنا واژووی ئەوەیە.

**مووروو:** یەك مووروو هاوڕێیەکی بێپشتگیرە، مورووی زۆریش ماڵو دارایی حەرامە.

* لەخەودا خزمەتکار یاخود ماڵو داراییە، ئەگەر بینی مووررووی بەدەستهێناوە ماڵو دارایی خزمەتکار بەدەستدەهێنێت.

ئەگەر نقێمی ئەموستیلەکەی بینی بوە بە مووروو لەگەوهەر دەچێ بانگەشەی ڕێزداریدەکات بەلام لەراستیدا وانییە، یاخود خۆی بەنەتەوەیەك دەچوێنێ بەلام لەوان نییە.

* ئەگەر ئەموستیلەیەکی نقێمداری بینی لەمووروودروستکرابوو کردیە پەنجەی دەبێت بەخاوەنی شتێكو دەترسێ لەدەستی بچێتو هەزار بکەوێت.

**مووروووان:** لەخەودا پیاوێکە کاروباری ژنان دەگرێتە دەستو جوانکاری تێدا ئەنجامدەداتو مووروووش ژنە.

**مووس(گوێزان):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هیچ خێرێکی تێدا نییە مەگەر گۆشتی پێ توێتوێ بکرێ یاخود ئاژەڵێکی پێبریندار بکات ئەوکات زوبانی پیسو زاڵەو خەڵکی ئازاردەدات.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا کوڕێکی نێرینەیە، چونکە منداڵی بێخەتەنە دەکرێت ، ئەگەر پێی بڕا بەسەرچوونی کارێکە خەریکە ئەنجامیدەدات.

* مووس بەڵگەیە لەسەر رقو قینو زوبانی درێژی بریندارکار.

**مووکێش:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیەلەسەر:

+منداڵی بەئارامو هێمن.

+ماندوبوونو هەوڵوکۆشش.

+گوفتار.

* بۆ بێکارە خزمەتە.

## م ۆ

**مۆخ(کرۆك):** (نابلسی): دەڵێت: مۆخو کرۆکی شتێك زانیاری بەسوودو دڵسۆزییە لەگوتەوکردارو نهێنیەکی چاکە.

**مۆرانە(خوورك):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مۆرانە بەکرێگیراوە یان دراوسێیە یان خزمەتکاری دزە، قوماشی ماڵ کەم کەم دەدزێ.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ململانێ لەزانستو دەمەدەمەدا، ئەوەی ببینێ لەکیس یان

گۆشانەکەیداوە ئەوا بەڵگەیە لەسەر مردنی.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: مۆرانە پیاوێکی دووڕوویانی فیتنەیە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر نەخۆشێك مۆرانەی بینی لەماڵەکەیدا یان دابوویە لەش ولاری دەمرێ.
*مۆرانە لەدەرگاو سەرجێگەدا یاخود لەسەر مێزی نانخواردن نەخۆشییە.
*دەگونجێت مۆرانە بەڵگەبێت لەسەر زۆری ماڵو منداڵو کەمی ماڵوسامان بەپێی ئەو گوتەیەی دەڵێن: منداڵ مۆرانەی ماڵەو مۆرانەش دوژمنی خانەوادەو خێزانە.
**مۆرکردن:** مۆرکردن لەخەودا ئەگەر بەتاڵبوو یا بەدەستی جنۆکەبوو یامۆردرا لەچاوو گوێو دەمو دڵ بەڵگەی خەشمو قینی خواییە بۆ یەکێك ئەگەر حاڵێکی لەو چەشنە رووی تێبکات.
*ئەگەر مۆری بەدەستی خۆیەوەبینیو مۆرکی دەدا لەماڵو خەرمانو شایستەی دەستەڵاتبوو پێیدەبەخشرێو گەر هەژاریشبوو دەوڵەمەنددەبێت.
**مۆرد:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: سەبارەت بە مۆرد وتراوە: پیاوێکە بەڵێنو پەیمان بەجێدەهێنێتو، نیشانەو بەڵگەی نائومێدیو بێزاریشە، ئەوەی ببینێ تاجو سەوڵەدانی مۆرد بەسەریەوەیەتی پیاو بێت یان ژن هاوسەرداری بەردەوام دەبێت، بەهەمان چەشن ئەگەر بۆنیکرد، ئەوەی لەماڵی خۆیدا بەدیبکات خێرێکی هەمیشەییەو ماڵو داراییەکی بەردەوامە.
*ئەگەربیبنی لەلاوێك مۆردی وەرگرت پەیمانێك لەدوژمن وەردەگرێت.
*ئەگەر بینی مۆرد دەڕوێنێ کاروبارەکانی بەرێکی جێبەجێدەکات.
*مۆرد کەتیرەو ئاوەدانی هەمیشەییە یان دەستەڵاتو خۆشحاڵییە.
(نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بۆنەخۆش بەڵگەیە لەسەر لەشساغیو میانەڕەوی گەلێكو داپۆشینی دەمو چاو بەقژ.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نائومێدی لەوەی بەدەستدێت.
**مۆری داخکردن:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر دڵی مرۆڤو دانانی ناوناتۆرە بۆیان.
*هەروەها گوتراوە: بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی نەخۆش.
**مۆز:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: مۆز بۆ داواکاری دنیا رزقو رۆزییە بەدەستی دەهێنێت بەپێی شوێنی روانی، بۆ

خوازیاری ئاین بەئەندازەی هێزیەتی لەبەندایەتیدا.

* دار مۆز بەڵگەیە لەسەر پیاوێکی دەوڵەمەندی باوەڕداری ڕەوشت بەرزو، رواندنی لەماڵێکدا بەڵگەیە لەسەر لەدایکبوونی کوڕ، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَطَلْحٍ مَنْضُودٍ﴾ (الواقعة: ٢٩).کەمۆزە.

* دارمۆز لەبەرێزترین دارەکانەو گەلاکانی باشترین گەڵایەو لێکدانەوەی بەپێی دارەکەیەتی.

(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ماڵێکی بەدەستهێنراو کوڕە یان مرۆڤ لەگۆڕ یان زیندانەکەیدا، یاخود کتێبێکی پڕ لەهەواڵی رابردووە، یاخود ئەو کتێبە بەرگ رەقانەی باسی زانیاریدەکات چونکە میوەکانی بەهەشتە: ﴿وَطَلْحٍ مَنْضُودٍ﴾.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر جلوبەرگو خۆشەویستیو تەبایی.

* مۆز پیاوێکی بەخشندەی خواناسی رەوشت بەرزو جوانە، ئەگەر لەماڵێکدا روا هاوەڵەکەی کوڕیدەبێ.

* ئەگەربینی خواردی ماڵو سامانی لەشەریکایەتیو پیاوێکی عەجەمیەوە دەستگیر دەبێت.

* مۆز بۆ بازرگان ماڵو داراییەو بۆ دنیانەویستان ئاینو خواناسییە بۆ نەخۆش خراپەو ترسی مردنی هەیە.

**مۆم:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مۆم دەستەڵاتدارە یان کوڕێکی پلەدارو سەخیو بەخشندەیە، کونی مۆم ماڵێکی حەلاڵە دەگات بەدەستی خاوەنەکەی دوای ماندوبوون.

(نابلسی)دەڵێت: مۆم بۆکەسێکی رەبەن بەڵگەیە لەسەر هاوسەرەکەی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەستەلات یان پیاوچاکێك، ئەگەر هاوسەرداربوو بەڵگەیە لەسەر دەستەلاتو رێنومایی بۆ نەزانو دەوڵەمەندیشە بۆ هەژار.

**مۆمدان:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هاوسەر بۆ کەسێکی رەبەنو، بۆ هاوسەریش بەڵگەیە لەسەر کوڕێکی جوانکیلە.

**م ە**

**مەتران**[1]: (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی بوە بەمەتران خەڵکی ملکەچی بۆ دەنوێنن پیاوێکی دەستەلاتدارە خەڵکی بانگدەکات بۆ بیدعەو بەئەندازەی ملکەچیان وەلامی دەدەنەوەو بەئەندازەی بەرزی بەرز دەبێتەوە ناوبانگی لەنێو خەڵکیدا بلاْودەبێتەوە.

*ئەگەر بەمەتران بانگکراو خۆی پێی خۆشبوو بیدعە یان درۆیەك دەکاتو پاشان تاوانبار دەکرێ پێی لەکاتێکدا بێتاوانە.

**مەچەکی ژن**: (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر هاوسەرەکەی یاخود ئەوەی بازنو شتیتری تێدەکات.

**مەرایی (چاودێری)**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر لەخۆبردنو چاکە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ "چاودێری ئابرووی باوەڕدار خێرە".

**مەرایکار**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی روپامایی بۆ کەسێکدەکات لەپێناوی خۆشییەکی دنیادا خراپو نابەجێیە.

*ئەگەربینی رووپامایی دەکات لەپێناوی زانیاریەکدا دەیەوێت فێرببێ یان چاکەیەك لەکاری باشەدا رێزو شکۆمەندی وەردەگرێ.

*روپامایی بۆ کەسێك راهاتبێت لەسەری باشەو بەپێچەوانەشەوە.

**مەردومی ئەزموندار**: (نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر سەفەر، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەرجوانکار هەڵدەسێ بەتاشینی سەری خەڵکیو قژی لێدەکاتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خاوەنی قژ یان پارە کۆکەرەوە بۆ بەرپرسو خاوەنکار.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر نوێنەرو شتومەك گوێزەرەوە لەشارێکەوە بۆ شارێکیتر.

**مەرگانە(شەربە)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر ئاوی لێبخواتەوە ماڵو سامان لەلایەن ژنو کچەوە بەدەستدەهێنێ.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر بینی ئاوی لەشوێنێکی نادیار خواردەوە لەسەر پشتی سفریەكو لەدەفرێکی نادیارو بەدەستی ئاودێرێك تەمەنی بەسەرچوە بەئەندازەی خواردنەوەی لەو دەفرە،

---

[1] **مەتران**: سەرۆکی قەشەکان. (وەرگێڕ)

دەگونجێت بەسەرچوونی رزق و رۆزی بێت لەوشارو گەرەك و بازاڕەی تێدایە.

*هەموو ناوێکی سازگا لەدەفرێکداماڵێکی حەلاڵی کۆکراوەیە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر خاوەن ماڵ. هەروەها بەڵگەیە لەسەر گەنجینەو فرۆشگاو هاوسەرەکەی کەدووگیانە لێی.

*مەشکەش هەمان راڤە هەڵدەگرێ.

**مەرەکەبی رەش:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: لەخەودا رێزو بەرزیو پلەوپایەو شادییە.

*ئەگەر کراسەکەی پیسبوو پێوەی یان کراسی کەسێکی تری پیسکرد پیسکەر دەکەوێتەسەریو بەلام پیسکراو سەردەکەوێو ناوبانگو پلەوپایە بەدەستدەهێنێ، دەگونجێت پیسکراو جلەکانی پەڵەپەڵەبێت.

**مەریخ:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر شەڕو ناخۆشیو ترس‌وبیم‌و خوێنڕێژی.

*ئەگەر کاتێ بینی دادەبەزی یاخود دەسووتا بەڵگەیە لەسەر ئاگرکەوتنەوەو ستەم‌و کردنەوەی قفڵو تەلاقدانی ژنان‌و رمانی ماڵ‌وخانوو.

*مەریخ خاوەن جەنگو سەربازە یاخود پۆلیسە.

**مەریەم(سەلامی خوای لێبێت)**[1]:

(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر (مەریەم)ی کچی (عیمران)ی بینی پلەوپایەو دەستەلات بەدەستدەهێنێ لەلایەن خەڵکییەوەو بەسەرجەم ویست‌و خوازەکانی دەگات.

*ئەگەر ژنێك ئەو خەونەی بینیو دووگیانبوو کوڕێکی داناو ژیریدەبێت، ئەگەر بوختانیان بۆکرد قوتاردەبێو خوداوەند پاکیو بێگەردی دەردەخات.

*ئەگەربینی کڕنووشی بۆ (مەریەم) برد لەگەڵ فەرمانڕەوا دەدوێو دادەنیشێ.

**مەڕ( پەز):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەماڵدا مەڕێك ببینێت بەداماڵراوی مرۆڤێك لەو ماڵەدا دەمرێ.

*ئەگەر بینی مەڕی دەلەوەڕاند دەبێت بەبەرپرسی کۆمەڵێك (عەرەب).

*ئەگەر بینی بوو بەخاوەنی یاخود بەدەستهێنا دەستکەوتێکی زۆر بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی گۆشتی مەڕ دەخوات خێرێکی زۆری دەستگیردەبێت.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: مەڕ لەخەودا دەستکەوتە، پێغەمبەر (ﷺ)

---

[1] **مەریەم:** دایکی حەزرەتی (عیسی)یە (سەلامی خوایان لێبێت). (وەرگێڕ)

دەفەرموێ: "لەخەودا بەلای کۆمەڵێك مەڕی رەشدا تێپەڕیمو بەعەرەب لێکمدایەوە ، پاشان بەلای مەڕی سپێدا تێپەڕیم بەعەجەمم لێکمدایەوە"[١].

*ئەگەر بینی کۆمەڵێ مەڕ لێدەخوڕێ لەگەڵ بزندا دەستەڵاتداریە بەسەر (عەرەب)و (عەجەم)دا.

*تاشینو خوری لێکردنەوەی بەدەستهێنانی ماڵو سامانە لێی.

*هەروەها ئەگەر جلەوێك مەڕی بینی خۆشحاڵی بەردەوامدەبێت.

*ئەگەر یەك مەڕی بینی خۆشحاڵی بۆماوەی ساڵێك بەردەوامدەبێت.

*جلەوە مەڕو سەروپێکەی زیادبوونی بژێوییە.

*زیادبوونی مەڕ زیادبوونی دەستکەوتە.

*ئەگەر بینی بەلای کۆمەڵێ مەڕدا تێپەڕی پیاوانێکن وەك مەڕ وانو هیچ ئومێدێکیان نییە.

*ئەگەر کۆمەڵێ مەڕ بەرەوپیری هات چەند پیاوێك بۆ کوشتار بەرەوپیری دێن.

*مەڕ (عەجەم)ەو بزنیش (پیاوە).

*ئەگەر بینی دوای مەڕێك کەوتوەو نایگرێتەوە زانیاری پووچەڵدەبێتەوەو نائومێدەبێت لەوەی خوازیاریبوەو دووگیش ماڵی ژنە.

*بزنەمێچکە کچە یان ژنێکی بێئابرووە.

*وتەی بزن بەڵگەیە لەسەر خێرو فەڕوپیت، مووی بزن ماڵو داراییە.

*کۆبوونەوەی مەڕ لەشوێنێکدا دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پیاوانێك کۆبوبووتەوە بۆ کارێك، ئەگەر مەڕی دەلەوەڕاند دەبێت بەکاربەدەست بەسەر خەڵکیەوە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا خەڵکی ژێردەستەی باشو گوێڕایەڵە، مەڕ بەڵگەیە لەسەر دەستکەوتو هاوسەرو ماڵو منداڵو کشتوکاڵو دارو درەختی بەردار.

*مەڕ ژنانی رێزداری جوانن کەخاوەن ماڵو ئابرووی داپۆشراون.

*بزن ژنی ئابرووبەخشو عەورەت نمایشکارە.

*مەڕ ئابرووی داپۆشراوە بەدووگ، ئەگەر بوو بەخاوەنی مەڕ دەستکەوت بەدەستدەهێنێ، ئەگەر بینی بازیدا بەسەریا پیاوی بێنەقڵە، ئەگەر بەپێوەبینی پیاون کۆدەبنەوە لەو شوێنەدا.

---

[١] لەسەرەتای پێشەکی (نابلسی) داهاتوە.

*ئەگەر مەڕی دۆزییەوە پلەوپایەو دەستەڵات بەدەستدەهێنن لەگەڵ دانایی و نازو نیعمەت.
*مەڕی سپی و رەش بەڵگەیە لەسەر خێر بەڵام سپی خێردارترە.
*ئەگەر بینی شێوەی گۆڕاوە بۆسەر شێوەی مەڕ دەستکەوت بەدەستدەهێنێ.
**مەڕمەڕ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندی و پلەوپایەبەرزی و ماڵ و دارایی و هاوسەری بەرزو خزمەتکار، ئەگەر لەخەودا بینی شتێکی وای هەیە دەوڵەمەنددەبێت لەدوای هەژاری یاخود هاوسەردەگرێ یان خۆشحاڵدەبێت، یاخود شتومەکی سوودمەند دەکڕێ، دەگونجێت زانیاری و زوبانپاراوی و منداڵ ساڵحی پێببەخشرێ ئەگەر شایستەی ئەوەبوو یان دەگونجێت پلەوپایەیەکی بەرێز بەدەست بهێنێت بەئەندازەی خۆی.
*ئەوەی لەمەڕمەڕ دروستدەکرێ بۆئەوەی خاوەنیەتی یاخود دەبێت بەخاوەنی بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی غەم و پەژارەو داهاتنی خۆشی و شادی و ژنی بەڕێزو منداڵی بەسوودو ساڵح لەگەڵ ماڵ و لانەی بەرزو رزق و رۆزی.

*گۆڕی مەڕمەڕو نەخشدار بەڵگەیە لەسەر دوایی و دەرەنجامباشی و کات و وادەی پیرۆزو پڕ میهر.
*مەڕمەڕی لەسەریەك هەڵچنراو بەڵگەیە لەسەر نووسینی جوان و هاوسەرگیری بەمارەییەکی زۆر مەگەر ئەو مەڕمەڕە لەئەندازە دەربچێ یان لەئاستی خۆی بێتەخوارەوە ئەوجا بەڵگەیە لەسەر گومان لەماڵ و منداڵ و هاوسەردا.
*بنەماکانی بەدەستهێنانی بەڵگەیە لەسەر سوودو قازانج و بڵاوکردنەوەی ناوناوبانگ.
*مەڕمەڕی ناسك بەڵگەیە لەسەر ژنی جوان و ناسك خاوەن پلەوپایەیەکی بەرزە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو خێرەی مرۆڤ بەلایدا تێدەپەڕێ و سەرسامدەبێت یاخود شەڕو خراپەیە.
**مەسیحی:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا سەرکەوتنە، پیری مەسیحی دوژمنە بەڵام شەڕو خراپەی نییە.
*ئەگەر بینی بوە بە مەسیحی لەبیدعەدا لەمەسیحیەکاندەچێت.
*ئەگەر بینی بوە بەمەسیحی میراتی پوورو خاڵی بۆ دەمێنێتەوە.
*ئەگەر پشتێنی پێوە بینی کوڕی دەبێ، ئەگەر شایستەی دەستەڵاتبوو

وەریدەگرێ چونکە پشتێن لەسەر جلوبەرگەوە دەستەڵاتە.

*ئەگەر بینی بەمەسیحی ناوبرا بەڵام پێی ناخۆشبوو جلوبەرگی سپی لەبەردابوو جوانبوو قوتاردەبێ لەکارێك لێیدەترسێ.

*مەسیحی پیاوێکە خۆشەویستی هەیەو بوون بەمەسیحی سەرکەوتنە بۆ یەکێك دەستەڵاتو دەوڵەتداری بوێت.

*مەسیحیەت بەڵگەیە لەسەر مەرکانەی بادەو ئاگرکەوتنەوە.

*مەسیحیەکان بەڵگەیە لەسەر بەراز بۆیەکێك بیان بینێت، هەروەها دوژمنن لەشێوەی هاورێدا.

*ئەگەر بینی بوە بەمەسیحیو دادگایی دەکرێ بەناحەق سەردەکەوێت.

**مەشعەری حەرام**[1] : (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پاراستنی ئامۆژگاریو بەجێهێنانی بریارو فرمانەکان.

*ئەگەر ترسی هەبوو دڵنیادەبێتو رێنومایی پێدەبەخشرێ.

**مەشقساز**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بۆ پیاو ماڵو داراییەو، بۆ یەکێك پەروەردە دابدات بەڵگەیە لەسەر کۆمەڵو تاقم، بۆ پیشەوەر بەڵگەیە لەسەر پیشەو هاوکارانی لەگەڵ خانەوادەکەی بەرژەوەندی دەپارێزنو لەژێر فەرمانبەرداری ئەودان.

**مەشکە** :(نابلسی) دەڵێت: ئاو لەخەودا سەفەرە، دەگونجێت ژنێك دووگیانبێتو لەباریبچێ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر هەژاریو دەوڵەمەندی.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر چوونە شوێنی تەنگو بێبوارەوە.

*ئەگەر مەشکەیەکی پڕی بینی لەناو لەماڵەکەیدا ژنەکەی دووگیاندەبێ چونکە ئاو کوڕە، مەشکە سکی ژنە.

*ئەگەر بینی مەشکەکەی دڵۆپە دەکات دەگونجێت سکی بچێت.

**مەککەی پیرۆز**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەئیمامو پێشەوا لێکدەدرێتەوە ئەو کەمو کوڕییەی رووی تێدەکات بیدەپاڵ پێشەوا یان دینداری خەوبینەر.

*ئەگەربینی (مەککە) بوە بەلانەی خۆی ئەگەر ئازادبوو شکۆمەندیو پلەوپایەیە بەدەستیدەهێنێو خەڵکی رووی تێدەکەن یاخود کچێکی هەیەو دەستنیشاندەکرێ.

---

[1] **مەشعەری حەرام**: شوێنو جێگەیە لەمزگەوتی (حەرام). (وەرگێر)

*ئەگــەر (مەككــە)ی خــستە دوای خۆیــەوە لەســەرۆك و گەورەكــەی جیادەبێتەوە.
*ئەگەربینی (مەككە) رووخێنراوە كەم نوێژدەكات.
*دەگونجێــت (مەككــە)بەڵگــەبێت بۆئـەوەی رووی تێدەكات یـان دەبێـت بــەخاوەنی لەســەر بــوكێكی شــۆخ و شەنگ كەپێشتر داواكاری زۆر بوو بێت.
*چــوونە نێــو(مەككــە) بۆكەســێكی سەرپێــچیكار تەوبەیــەو بــۆ بێبــاوەڕ موسوڵمانبوونەو بۆ رەبەن هاوسەرە.
*ئەگــەر خەوبینــەر كێــشەی هــەبوو بەڵگەیە لەســەر دۆڕاندنی نەیارەكەی و زاڵبوون بەسەریا.
*دەگونجێــت چــوونە نێــو (مەككــە) بەڵگەبێت لەسەر دڵنیایی لەترس وبیم.
*ئەگــەربینی چــوو بــۆ (مەككــە) هــەتا (حەج)بكات(حەج)ی لەچارەدەنووسرێ پــشت بــەخوا، ئەگــەر نەخۆشــبوو نەخۆشــیەكە درێژەدەخایــەنێت، دەگونجێــت بمرێــت و بــچێتە نێــو بەهەشتەوە.
*ئەگەربینی لە(مەككە) لەماڵێك لایداوە دەستەڵاتی پێدەدرێ.
*ئەگــەربینی دراوســێی (مەككــە)یــە تەمەنێكی دوورودرێژ بەسەر دەبات.

*ئەگــەربینی لــە(مەككــە)یــە لەگــەڵ مردواندا بەشەهیدی دەمرێت.
*ئەگــەر (مەككــە)بــوو بــەماڵی تێــدا دەمێنێتەوە.
*ئەگــەر خــۆی لــە(مەككــە)دا بینــی و ســەردانی (كابــە)ی دەكــردو بــەهۆی بازرگانیــەوە رووی تێكردبــوو هــیچ مەبەســتێكی تــری نــەبوو ئــەوە سووردەبێ لەسەر دنیا.
*ئەگەر خۆی لەسەر رێگەی (مەككە) دییەوە (حەج)دەكات.
*ئەگــــەر بەفەرووپیتــــەوە بینــــی خێروچــاكەیە بــۆی، ئەگــەر بەوشــكی بینی پێچەوانەی ئەوەیە.

**مەلــەكردن:** (ئــیبن ســیرین) دەڵێــت: ئەگــەر بینــی لــەدەریادا مەلــەدەكات و زانــابوو لەزانیاریــدا دەگــات بەویــست و خوازی خۆی.
*ئەگــــەر لەوشــــكانیدا مەلــــەیكرد دەســتگیردەكریێ و لەزینندانــدا تــەنگی پێهەڵدەچــنرێ و تیایــدا دەمێنێتــەوە بەئەنــدازەی مەلەكردنەكــەی یــاخود سووكی و ئاسانی و هێزو توانای.
*ئەگــەر بینــی لەدۆڵێكــدا مەلــەدەكات هەتا دەگات بەشوێنێك خۆی دەیــەوێت كــاری دەســتەڵاتدارێكی ســتەمكار

ئەنجامدەداتو داوایەکی لێدەکاتو بۆی بەجێدەهێنێتو خوداوەند دەیپارێزێ بەئەندازی رۆینی لەدۆڵەکەدا.

* ئەگەر ترساندنی دەستەڵاتدارێك بەوچەشنە دەیترسێنێ، ئەگەر چوە نیو قوولایی دەریاوەو بەباشی مەلەیکرد روو لەکاروبارێکی گەورە دەکاتو دەستەڵاتی مەزنی پێدەسپێردرێو زاڵدەبێت بەسەریاو مەزنیو شکۆمەندیو هێزی بەدەستدەکەوێت.

* ئەگەر پشتە مەلەیکرد لەگوناهو تاوان پاشگەز دەبێتەوەو تەوبەدەکات.

* ئەگەر مەلەیکردو ترسا ترس‌وبیم بەدەستدەهێنێت یان نەخۆشیو زیندانی دێت بەسەرا ئەمەش بەئەندازەی دووری لەوشکانییەوە.

* ئەگەر وایزانی قوتار نابێت لێی لەو غەمو پەژارەیەدا دەمرێت.

* ئەگەر چاونەترسبوو لەمەلەکردنیدا لەوکارەدا پارێزراو دەبێت.

* ئەگەر دەستەڵاتدارێك بینی دەیەوێت لەدەریادا مەلە بکاتو دەریاش شڵەقاو هەژاربوو بەهۆی شەپۆلەکانیەوە کوشتارو جەنگ لەگەڵ فەرمانڕەواو دەستەڵاتدارێك بەرپا دەکات، ئەگەر دەریای بەمەلەبڕی ئەو فەرمانڕەوایە دەکوژێ.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەدەریایەکدا مەلەیکردو ئاوەکەی راوەستابوو روو لەکاری پادشاو فەرمانڕەوایەك دەکات، ئەگەر دەریاکەی بڕیو پەڕیەوە قوتاردەبێت.

* هەموو دەریاو دۆڵێکی وشك بووبێت دەوڵەتو دەستەڵاتە دەدرێتە پاڵی.

* ئەگەر بینی لەروبارێکدا مەلەدەکات یان لەدەریاچەیەکداو خەریکە دەخنکێو لەدەریاکە بەخنکاوی دەریانهێنا وەك ماسی کاتێ فڕێیاندایە سەرزەوی مرۆڤە لەئاودا ناڕەحەتی دێتەرێ، هەروەك چۆن ماسی لەوشکانیدا ناڕەحەت دەبێت، ئەگەر مۆڤ بەرلەوەی بەئاگابێت لەخەوەکەی بەمەلە قوتار ببێت رزگاریدەبێت.

* ئەگەر بینی خەریکە تیادەچێو سواری کەشتیەکبوەو وەختە قوتار دەبێت یان دەستدەگرێ قوتاردەبێ.

* ئەگەر بینی بەمەلە چوە نێو دەریایەك هەتا وندەبێو نابینرێ تیاچوونو فەوتانیەتی.

* ئەگەر بینی ئاو دایپۆشی هەتا خنکا یاخود بینی لەنێو ئاوەکەدا مرد بەشەهیدیدەمرێ.

*هەروەها دەڵێن: بەگوناهو تاوانێکی زۆرەوە دەمرێت.
*ڕۆیشتن بەسەر ئاوی دەریاو ڕووباردا بەڵگەیە لەسەر باشی ئاینو دڵنیایی دروست.
*هەروەها دەڵێن: دڵنیادەبێت لەکاروبارێك کەپێشتر گومانی هەبوە بەرانبەری یاخود سەفەر دەکات بەپشتبەستن.
*ئەگەر بینی بەسەر ئاوەکەوە دەڕوات بەڵاو نەهامەتی لەدەستەڵاتدارێکەوە دێت بەسەریا.
**مەلەوان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مەلەوان فەرمانڕەوایە یا هاوچەشنیەتی، ئەگەر بینی لەنێو دەریادا ڕۆچوو دەچێتە نێوکاری فەرمانڕەواو دەستەڵاتدارەوە.
*ئەگەر بینی گەوهەری دەرهێنا کچێکدەهێنیّو کوڕێکی لێدەبیّ بەپێی ئایەتی: ﴿ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴾ (الطور: ٢٤).
*هەروەها بینینی ڕۆچوون بەڵگەیە لەسەر داواخوازی زانیاری پەنهانو نهێنی، هەروەها داواخوازی ماڵ بەمەترسیو ئەبەندازەی گەوهەرەکە خوازوداوای بەدەستدەهێنیّ.

(نابلسی) دەڵێت: مەلەوان پیاوێکە ڕوو لەکاروباری پەنهانو نهێنیدەکات.
*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر:
+زانیاری.
+کەسی مەزن.
+پێشەنگی ڕێنوماییکاران
+ڕاڤەکارو لێکۆڵەر.
**مەلاشوو:** (نابلسی)دەڵێت: مەلاشوو دوو هاوسەر یا دووشەریك یاخود دووکوڕە.
**مەمك:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: مەمك لەخەودا ژنو کچی پیاوە، جوانیو ناشیرینی مەمكو باشیو خراپییەتی.
*ئەگەر بینی ژنێك بەمەمك هەڵواسراوە تووشی زینادەبێتو کوڕێکی نادروست دەخاتەوەو بەپێی وتەی پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بەدیمەنێکی شەوڕەوی کەدەفەرموێت: "ژنێکم بینی بەمەمك هەڵواسرابوو ، پرسیم لە(جبریل): ئەمە کێیە؟ وتی: ئەمە بەزیناو داوێنپیسی منالی خستوەتەوە".
*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا مەمك زلێکم بینی ، (ئیبن سیرین)دەڵێت: تۆ لەگەڵ مەحرەمێکدا زینادەکەیت یاخود دەگونجێت لێکدانەوەی ئەم خەوە بەچەشنیّ بێت خاوەنەکەی مارەبڕینێکی نادروست ئەنجامبدات.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر پیاوێك لەمەمكیدا شیری بینی ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێو منداڵدەخاتەوە، ئەگەر هەژاربوو بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندبوونو خۆشنوودی، ئەگەر لاووگەنجیشبوو تەمەندرێژدەبێت.

*ئەگەر ژنی لاووگەنجیش خەوێكی ئابەم چەشنەی دی بەڵگەیە لەسەر دووگیانیو منداڵبوونی، ئەگەر پیرەژنیش بینی ئەوا بەڵگەیە لەسەر هەژاركەوتنی، بینینی كچیش بۆ خەوێكی ئاوا بەڵگەیە لەسەرمێردكردنی بەڵام ئەگەر كچێكی منداڵبینی بەڵگەیە لەسەرمردنی.

*درێژی مەمكی پیاو بەڕادەیەك بلەرێتەوە بەڵگەیە لەسەر حەزو ئارەزوو بەگەڕخستنی لەكاروباری بەدەر لەرەزامەندی خودایا. هەروەها دەڵێن: بەڵگەیەلەسەر مەرگی منداڵ، ئەگەر منداڵینەبوو بەڵگەیە لەسەر هەژاریو خەموپەژارە.

*شۆڕبوونەوەی مەمكی ژن بەئەندازەیەك لەرادەبەدەر بەڵگەیە لەسەرئەوپەڕی غەموپەژارە چونكە ژنان كاتێ غەموپەژارە روویان تێدەكات مەمكیان رادەكێشنو دەیرنن.

*ئەگەربینی شیردەدات بەژنێك ئەخۆشدەكەوێت مەگەر ئەو ژنە هاوسەرەكەی خۆی بێت ئەوجا كوڕێكی دەبێت، ئەگەر خەوبینەر ژنبوو كچێكیدەبێت.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر مەمكەكانی بەئەندازەی خۆیانگەورەبوونو جوانبوو بەڵگەیە لەسەر منداڵو شتیتر كەدەبێت بەخاوەنی، ئەگەربینی شۆڕبوونەتەوە بەڵگەیە لەسەر مردنی منداڵەكانی، ئەوەی منداڵی نەبێت بەڵگەیەلەسەر هەژاركەوتنی، هەروەها بەڵگەیە لەسەر غەموپەژارە بەتایبەت لەبارەی ژنی شیردەر.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئافاتو بەڵاو نەهامەتی بۆئەوەی شیری پێدەدات.

*ئەگەربینی مەمكی شۆڕبۆتەوەو دەیداتەوە بەسنگیدا بەڵگەیە لەسەرئەوەی هەواڵی ناخۆشی پێدەگات ئەگەر خەوبینەر بەتەمەنبوو ئەگەر ژنوپیاوی لاویشبوو بەڵگەیە لەسەر عیشق.

*ئەگەربینی لەگەڵ هەردوو مەمكیدا مەمكیتری لێدەرهاتووە بوونی منداڵكی مێیینەیە.

*ئەگەربینی مەمكێكی كەمیكرد مردنی كچەكەیەتی، ئەگەر شیری لەبەرۆیی

دەروازەی لێدادەخرێت‌و، هیچ خێرێکی نییەو، بۆ کەسێك شیربخوات غەم‌وپەژارەیە.

*مەمکی پیاوان بەڵگەیە لەسەر براو هاوەڵ‌و هاوسەر کەوا هیچ سوودێکیان نییەو وێڕای جوانیشی بەڵام مەمکی ژن پێچەوانەی ئەوەیەو بەڵگەیە لەسەر رزق‌و رۆزی.

*ئەگەربینی مەمکی وەك مەمکی ژن وابوو شیری لێدەتکا بەڵگەیەلەسەر سەرپەرشتی منداڵەکانی‌و بەدەمەوەچوونی ژن ، دەگونجێت ئەوەش بەڵگەبێت لەسەر دینداری‌و ئارامگرتن، یاخود نەخۆشی بێت بەسەریاو شەرم بیگرێ لەوحاڵەی، ئەگەربینی ئەوا بەوەوە ناوبانگدەردەکات.

*ئەگەر مەمکەکە لەمسبوو یان ئاسن بەڵگەیە لەسەر منداڵ مردن‌و پووچەڵبوونەوەی هۆکارو، مەمکیش بەشێرەوە مێردە.

*مەمك بەژنی نەزۆکەوە منداڵێکی نێرینەیە دوای نائومێدی.

*دەگونجێت مەمك بەڵگەبێت لەسەرئەوەی خۆی پێدەڕازێنێتەوە لەجوانکاری یان ماڵ‌و دارایی.

*مەمك بۆ منداڵی نێرینەو مێینە نەخۆشی‌و پەتاو برینە.

*مەمکەمژە کەل‌وپەلە.

*یەك مەمك بۆ ژنێکی رەبەن هاوسەرگیرییە، ئەگەر ئاو یان شیری لێتکاو هاتەخوارەوە هاوتای خۆی دەبێت، وەگەرنا کوڕەکەی یان خوشکەکەی لەدەستدەدات.

*مەمك ژنێکی داوێنپیسە.

*هەروەها مەمکیان بەهێلکەی حوشترمورخ یان نارنج لێکداوەتەوە یاخود باوك‌و دایك.

*مەمکیش بەڵگەیەلەسەر مەی ئەگەر شیری تێدابێت.

*هەروەها دەڵێن: مەمكِ پیاوێکی بەخشندەیە.

**مەمك دەرتۆقیو:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: جووڵانی مەمك‌و یاری پێکردنی خۆ خەریککردنە بەپووچ‌و بەتاڵەوەو دەڵێن: بەڵگەی خێرە.

**مەمك زل:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: پیاوێکە لەسەر دەستی ئەودا ماڵی جەلاڵ بەدەستدێت‌و لەکاری چاکەدا خەرجیدەکات.

**مەنجەڵ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مەنجەڵ بژێوی پەیداکاری ماڵە.

*هەروەها دەڵێن: ژنێکی عەجەمییە، ئەگەر بینی لەمەنجەڵدا چێشتی لێنا ماڵو داراییەکی مەزن بەدەستدەهێنێ لەلایەن دەستەلاتدارەوە یان شایەکی عەجەمییە.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەلگەیە لەسەر زانایەکی دانیشتوو لەسەر کورسیو ئەو گۆشتو دەرمانەی لەخواردنەکەدایە سوودەکانیەتی بۆیەکێك وازی لێبێنێ.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر ژنێك تەلاقدرابێت ئەگەر بکولێ.

*مەنجەڵ پیاوێکە نازو نیعمەتی خۆی بۆ سەرجەم خەڵکی دەردەخاتو بۆدراوسێکانیشی بەتایبەت.

*مەنجەڵ لەماڵی نەخۆشدا ئەگەر کولا ئاگری لەژێردابوو نەیزانی چی تێدایە سێپاکە جێگەی نەخۆشەو بلێسەی ئاگر نارەحەتیەکانیەتیو کولاندنی دوودڵیو دڵەراوکەیە ئەگەر ئاگرەکە لاچوو یان دامرکایەوە نەخۆشیەکەی دەرەوێتەوە، مەنجەڵەکەش خۆیەتی، ئەگەر لەگۆشتەکەی خوارد بەلام نەکولابوو رزقو رۆزی لێدەستدەکەوێ ئەگەر شتێکی لێهەلگرت سوودی لێدەبینیو ماڵو سامانی دەستگیردەبێتو کۆیدەکاتەوەو توانینە لەسەر رازیبوون بەوەی روویداوە.

**مەنجەڵساز:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی تەمەندرێژە ، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿وقدور راسيات﴾ (سبأ:١٣).

**مەنجەڵی هەڵمپەست:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مەنجەڵی هەڵمپەست بژێوی پەیداکاری ماڵە لەوەچەی مەسیحیەکان.

**مەنجەنیق:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: مەنجەنیقو هاوێژەر بەلگەیە لەسەر بوختانو توهمەتبارکردن.

*ئەگەربینی قەلایەکی بێباوەڕان دەداتە بەر رێژنەی مەنجەنیق کۆمەڵێك بانگدەکات بۆ خێروچاکە.

(نابلسی)دەڵێت: مەنجەنیق فروفێڵو سەرکەوتنە بەسەر ستەمکارانداو دەگونجێت تیاچوونی بێباوەڕانی تێدابێت، ئەگەر هاوێژەری مەنجەنیق دەستەلاتداربوو بەردێکی گرتە مرۆڤ نوێنەرێکی بۆ رەوانە دەکات دڵڕەقو زبرە.

*بینینی هاویشتن بەمەنجەنیق ناپاکیو فروفێڵە، دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر پلارگرتنە زانایانو ناچارکردنیان بەتوهمەتبارکردنی ژنانی داوێنپاكو پلارگرتن لەئاین.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر فیتنەو ئاشوب لەشوێنێکدا دەبینێت سازێنراوە بۆ هاویشتن.

**مەی (بادە)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: مەی بەڵگەیە لەسەر فەرپیت بۆ یەکێك بەدەستی بهێنێت، ئەگەر بینی مەی ئامادەدەکاتو دەگوشێ خزمەتی دەستەلاتدارێکدەکاتو لەسەر دەستی ئەوا کاروباری مەزن روودەدات.

*مەی لەبنەرەتدا ماڵێکی حەرامە بێماندبوون، ئەگەر بینی مەی دەخواتەوە گوناهو تاوانکی گەورە ئەنجامدەدات لەگەڵ رزقو رۆزییەك بەپێی ئایەتی: ﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا ﴾ (البقرة: ٢١٩).

*ئەگەر بینی مەی دەخواتەوە هیچ کەسێك بەربەرەکانی ناکات تێدا ماڵێکی حەرام بەدەستدەهێنێت، هەندێکدەڵێن بەڵکو ماڵێکی حەلالە، ئەگەر خواردیەوەو بەربەرەکانیان لەگەڵکرد لەخواردنەوەیدا لەقسەو دژایەتیدا بەربەرەکانی لەگەڵ دەکەن بەو ئەندازەیە.

*ئەگەر بینی روبارێك لەمەی بەدەستهێنا فیتنەو ئاشوب لەدنیادا رووی تێدەکات، ئەگەر چوە نێوی دەکەوێتە نێو فیتنەوە بەوئەندازەیە.

*هەندێك لەراڤەکارانی خەو دەڵێن: بەتەنیا مەیخواردن لەخەودا خراپ نییە بەڵکو ئەگەر مرۆڤێك خۆی لەنێو کۆمەڵێك مەیخۆردا بینی خراپە چونکە سەرخۆشی دێت بەدوایدا.

*هەروەها دەڵێن: مەی بۆیەکێك هاوسەرداری بوێت رازیبوونە بەهۆی تێکەڵبوونەوە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك بینی رووی رەشبوەو سەری پاكو ساف تاشراوەو مەی دەخواتەوە ، خەوەکەی بۆ راڤەکارێکی خەو گێڕایەوە ئەویش وتی: رەشی دەموچاوت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەبیت بەبەرپرسی گەلو نەتەوەکەت تاشینی قژی سەریش گەلو نەتەوەکەت پشتت تێدەکەنو فەرمانڕەوایی لەدەستدەدەیتو خواردنەوەی مەیو بادەش بەڵگەیە لەسەر زەوتکردنی ژنێك.

*پیاوێکیش هات بۆلای (ئیبن سیرین)و وتی: لەخەودا بینیم وەك ئەوەی دوو دەفرم لەبەردەستدایە لەیەکێکیاندا شەرابو ئەوی دیکەش شیربوو، ئەویش وتی: شیر دادپەروەرییەو شەرابیش دوورخستنەوەیە ، ئەوەندەی بەسەردا رانەبورد لەسەرکار لابرا.

* خواردنــەوەی مــەی بــۆ فــەرمانڕەوا لابــردن و دوورخــستنەوەیە، شــەرابی خورمــا مــاڵ و داراییــەکی گوماناوییــە، خواردنــەوەی شــەرابی خورمــا غــەم و پــەژارە داگرتنــە، هــەروەها جیــاوازی هەیە لەنێو ڕاڤەکارانی خەودا سەبارەت بەخواردنــەوەی بــادەو مەیــەك ئــاوی تێکەڵبکرێ ، گوتراوە: ئەوکەســە مــاڵ و داراییــەك بەدەســتدەهێنێت هەنــدێکی حەلاڵ و هەندێکی حەرامە، یاخود مــاڵ و داراییــەك بەشــەریکی دەســتدەکەوێت، یــاخود وتــراوە: مــاڵ و سامان لــەژنێك وەردەگرێت و دەکەوێتە نێویەوە.

(نابلسی)دەڵێــت: ئەگــەر بینــی بــانگ دەکرێت بۆ کۆڕێك بــادەو مــەی تێدایە لەگەڵ میوەیەکی زۆردا بانگدەکرێت بــۆ جیهــادو شــەهیدبوون مــەی و بــادە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر فیتنــەو شــەڕو ئاژاوەو ڕق و قین.

* دەگونجێت خواردنەوەی مــەی و بــادە بەڵگەبێت لەسەر:

+چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

+ئــەقڵ و ژیــری لەدەســتدان بــەهۆی شــێتبوونەوە یــاخود غــەم و پەژارەیــەك لەهۆشی خۆی ببات.

* ئەگەر خەوبینەر بەربەرەکانی کــاربوو نــەیارو دژوارەکەیــەتی کەبەناحــەق بەربەرەکانیــدەکات، ئەگــەر بێکــاربوو کاری دەستدەکەوێت، ئەگــەر هــەژاربوو دەوڵەمەنددەبێت، ئەگەر نــەخۆش بێــت چاکدەبێتەوە.

* ئەگــەر مــەی و بــادەخۆر لــەنێو گــەل و کۆمەڵێکــــدابوو مــــەی و بادەیــــان دەخــــواردەوە بەڵگەیــــە لەســــەر پاشــگەزبوونەوەیان و شــکانی بــەڵێن و پــــەیمان کەداویانــــە بەبــــەرپرس و فەرمانڕەوا.

* ئەگــــەر مــــەیخۆر زانــــابوو زانیــــاری زیاددەکات.

* ئەگەر مــەی و بادەکــە لــەترێ گیرابــوو خەوبینەر ترێ لــەکاتی خۆیــدا نــاخوات یاخود پێویستی بەچێشت لێنەر دەبێت یــاخود دەکەوێتــە نێــو کــەم و کــوڕی و خراپەوە.

* دەگونجێت ڕزق و ڕۆزی حەلاڵ بــدرێ، ئەگەر مەی و بادەکە فرۆشــرابوو یــاخود خــــۆی گوشــــی و مــــەی و بــــادەی لێدروستکرد دەگونجێت بکەوێتە کــاری حەرام و بەهۆیــەوە شایستەی نــەفرەت بێت.

* مەی و بادە بەڵگەیە لەسەر:

+درۆو قسەی هەڵەت و پەڵەت.

+نهێنی دەرخستن و زینا.

* دەگونجێت خواردنەوەی لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر خراپەکردن لەگەڵ دایكو باوكو ئازاردانیان یاخود فرۆشتنی موڵكو شتومەك.
* دەگونجێت خواردنی مەی بەڵگەبێت لەسەر:
+قەرزی بێسوود.
+لەکیسچوونی ماڵو سامانو رۆینی باوك.
* دەگونجێت مەیخۆر بەڵگەبێت لەسەر پشوو و ماندودەرکردن ئەگەر شەکەتو ماندووبێت.
* مەیخواردن بەڵگەیە لەسەر گێلیو نەفامی مەیخۆر.
* ئەگەر مردوویەکی بینی مەی دەخوات لەقیامەتدا نازو نیعمەت دەرژێت بەسەریا ئەوە لەشەرابی خەڵکی بەهەشتە.
* مەی بەڵگەیە لەسەر خێر بۆ یەکێك بیەوێت هاوسەربگرێ.
(ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی خراپەو بەدەستهێنانی مەی لەهەنگوینەوە بەدەستهێنانی دەستکەوتە لەپیاوێکی قەڵەوی سووکو رسواوە.
**مەیفرۆش:** بینینی بەڵگەیە لەسەر:
+داواخوازی بژێوی.
+چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر:
+خەوبینەر.
+فرۆشەری پیسی وەك بەرازو مەیمونو ئامرازی ئارەزووبازی.
* مەیفرۆش پیاوێکە ماڵو داراییدارو خاوەن بژێوی حەرامە.
* ئەوەی شەراب دروستدەکات خەڵکی دەوروژێنێ بۆ ناحەقیو خۆی سوودمەندبێت.
**مەیموون:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مەیمون پیاوێکی هەژارە لەنازو نیعمەت بێبەشە، هەروەها پیاوێکی فێڵبازی دەنگەدەنگکاری لیکنە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر جوولەکە.
* ئەگەر بینی لەگەڵ مەیموونێکدا جەنگاو زاڵبوو بەسەریا تووشی نەخۆشی دەبێتو پاشان چاکدەبێتەوە، ئەگەر مەیموونەکە زاڵبوو بەسەریا چاکنابێتەوە، ئەگەر مەیموونێکی بەدیاری بۆ نێردرا زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا.
* ئەگەر لەگۆشتی مەیموونی خوارد غەمو پەژارەیەکی توند رووی تێدەکات.
* ئەگەر راوی مەیموونێکیکرد سوودو قازانجی لەجادووگەرانەوە پێدەگات.
* ئەگەر مەیموونێکی مارەبڕی گوناهو تاوان ئەنجامدەدات.

*ئەگـــەر مـــەیموونێك گـــازی لێگـــرت لـــەنێوان خـــۆی و کەســێکیتردا ئـــاژاوە ڕوودەدات لەگەڵ دەمەدەمە.

*هـــەروەها دەڵـــێن: ماســـی پیاوێکـــە گوناهو تاوانی گەورە ئەنجامدەدات.

*ئەگـــەر بینـــی مـــەیموونێك دەچـــێتە جێگـــەی مرۆڤێکـــی ناســـراو ئەگـــەر جوولەکەیـــەکی بێبـــاوەڕبوو ژنەکـــەی تووشی داوێنپیسیدەکات.

*هـــەروەها دەڵـــێن: ئەگـــەر گۆشـــتی مـــەیمونی خـــوارد جلوبـــەرگی نـــوێ بەدەستدەهێنێت.

(نابلسی) دەڵێت: مـەیموون لەخـەودا پیاوێکە هەموو کەموکوڕییەکی تێدایە، ئـەوەی گۆشـتەکەی بخـوات چارەسـەر لەکەموموڕییـــــەك وەردەگـــــرێو چاکنابێتەوە.

*ئەگـــەر بینـــی بـــوە بەمـــەیموون لەجادووگـــەران ســـوودو قـــازانج وەردەگرێ.

*مەیموون دوژمنێکی دۆڕاوە.

*ئەگـەر بینـی سـواری مـەیموونێکبوە دەیبـات بـەرەو هـەر لایـەك بیـەوێت زاڵدەبێت بەسەر دوژمنەکانیدا.

*ئەگەر بینی مەیموونی پێدرا دوژمنـەو زاڵدەبێ بەسەریا.

*ئەگەر بینـی مـەیموونێکی پێبەخـشرا ناپاکە لەوەی متمانەی پێکراوە.

*ئەگـــەر مـــەیموونێکی بەسەرشـــانی خۆیـەوە بینـی لـەماڵی خۆیـدا دزێـك دەگرێت و ئابڕوویدەبات.

*هەروەها دەڵێن: مـەیموون بـۆ یـەکێك ببێـت بـەخاوەنی بەدبەختییـە یـاخود ئەگەر هەڵیبگرێ.

*مـــەیموون کەســـێکە نـــازو نیعمـــەتی لێـسەندراوەتەوە بـەهۆی گونـاهێکی گەورەوە کەئەنجامیداو.

ئەگـەر بینـی بـوە بەمـەیموون لەلایـەن جادووگەرانـــەوە ســـوود وەردەگـــرێ، دەگونجێت حەز لەداوێنپیسبکات.

*هـەروەها مـەیموون بەڵگەیـە لەسـەر سەرپێـــچیو دژایـــەتیو کەوتنـــەنێو کارێکەوە شایستەی خەشمو قین بێت.

*دەگونجێـــت بەڵگـــەبێت لەســـەر جوولەکە، خـواردنی گۆشـتی مـەیموون هـــەژاریو پێداویـــستییە، خـــواردنی گۆشـــتی بـــەراز ڕزقو ڕۆزیو ســـوودو قازانجە، سوورکردنەوەی گۆشتی بـەراز خۆشـیو شـادییە، سـوودی تێدانییـە بۆیەکێك شیاوبێت بۆی.

*دەگونجێـــت خـــواردنی گۆشـــتی بەڵگـــەبێت لەســـەر داوێنپیـــسیو مەیخواردن.

*مەیموون پیاوێکی هەژاری نەدارەو نازو نیعمەتی لێسەندراوەتەوە.

## م ی

**میر:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی میرو بەرپرس بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤ جیادەکاتەوەو قوتاریدەکات یاخود فەرمانو ئەرك دەخاتە ئەستۆی.

*بەڵگەو نیشانەیە لەسەر هاوسەرگیری رەبەن هەتا لەماڵی خۆیدا وەك میرو پادشای لێدێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بەختو چارەنووسی باش لەئاستی ئەوەی کەدەیەوێت ئەنجامیبدات.

*ئەوەی لەخەودا ببێت بەمیر دەگونجێت زیندانی بکرێتو کۆتو زنجیر بکرێتە پێیو دەستی چونکە میرو سەرکردە لەرۆژی قیامەتدا بەدەستی کۆتو بەندکراو دەهێنرێنو هیچ کەس فریایان ناکەوێت دادپەروەری خۆیان نەبێت.

*ئەوەی ببینێ دەستەڵاتدارو میر لەشوێنێکی دوور فەرمانڕەواییەکی پێسپاردوە رێزو شکۆمەندیو پلەو پایەیە ئەو رێگە شوێنەش دووریدەخاتەوە لەرێگەی دەستەڵاتدارو میر.

*ئەگەر میرێك ببینێ دەستەڵاتەکەی هاتوەتە بەردەستی لابردنی دێتە پێش، هەروەها ئەگەر تەماشای کاروباری بکات لابردنیەتیو نامێنێتەوەو هەتا هاوچەشنی ئەوەببینێت مەگەر چاوەڕێی کورێت خودا پێیدەبەخشێ.

*هەروەها ئەگەر ببینێ ژنەکەی تەڵاقدەدات لەسەرکار لادەبرێت.

*ئەوەی خواردنێك ببات بۆ فەرمانڕەواو سەرکردەیەك خەمو خەفەت رووی تێدەکاتو پاشان خوادوەند لەلایەکەوە چاوەڕێ نەبوە لێوەی بەدەستیبگات.

*دانانی کڵاوو جبەو گومەزو هۆکاری ناوچە لەلایەن پێشەواو میرەوە مانەوەیەتی لەسەر دەستەڵاتو فەرمانڕەوایی.

*لەبەرکردنیی دەستبەکاربوونو پیادەکردنی سیاسەتیەتی.

*لەپێکردنی سۆڵێکی نوێ بردنەوەو بەدەستهێنانی ماڵو سامانی کەسانی ناموسوڵمانە.

*لابردنی فەرمانڕەوا لەخەودا دانانیەتی.

**میز:** (ئیبن سیرین) دەڵێت : میز لەلێکدانەوەدا ماڵێکی حەرامە، ئەوەی ببینێ لەشوێنێکی نادیار میز دەکات لەوشوێنەدا ژنێك دەهێنێو تیایدا منداڵ

دەخاتەوەو دەبێت بەخزمی جێنشینانی ئەو شوێنو جێگەیە.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی ببینێ وەك ئەوەی میز دەكات خێرێكدەكاتو بۆخۆی دەگەڕێتەوە بەپێی ئایەتی ﴿وما أنفقتم من شيء فهو يُخلفه وهو خيرُ الرازقين﴾(سبأ: ٣٩).

*ئەگەر وای بینی میز دەكاتە بیرێكەوە لەماڵو داراییەكی حەلاڵ دەبەخشیو خێردەكات.

*ئەگەر بینی میز دەكات بەسەر شتومەكو كاڵایەكدا نرخی ئەو شتومەكو كاڵایە دادەبەزێ.

*ئەگەر لەدوانگەو میحرابێكدا میزیكرد كوڕێكی زانای پێدەبەخشرێ.

*ئەوەی ببینێ كەم كەم میزدەكاتو دەوەستێ ئەگەر دەوڵەمەندبوو هەندێك لەماڵەكەی بەسەر دەچێت، ئەگەر دەردو بەلا رووی تێكردبوو هەندێكی بەسەردەچێت.

*ئەگەر بینی خۆی میز دەكاتو یەكێكیتریش لەگەڵی میزدەكاتو میزی هەردووكیان تێكەڵبوو، ژنو ژنخوازیو خزمایەتی لەنێوانیاندا روودەدات.

*ئەگەر بینی میزی گیراوە ژنەكەی تووڕەدەكات.

*ئەگەر میز زۆری بۆ هێناو شوێنێكی نەدۆزییەوە میزی تیابكات ماڵو سامانەكەی نازانێت لەكوێ هەڵبگرێت.

*ئەگەر وای دەبینی لەشوێنی میزكردنی میزیكرد خوا دەرووی لێدەكاتەوە ئەگەر هەژاربێت، ئەگەر دەوڵەمەندیشبێت ماڵو داراییەكەی لەدەستدەدات.

*ئەگەر بینی خەڵكی میزەكەی هەڵدەسوون لەدەمو چاویان كوڕێكی دەبێت خەڵكی شوێنی دەكەون.

*ئەگەر مرۆڤو كەسێكی ناسراو میزی پیاكرد خێرپێكردنە.

*ئەگەر مرۆڤو كەسێكی ناسراو میزی پیاكرد خێر پێكردنە.

*ئەگەر ژنێكی بینی میزێكی زۆریكرد حەز لەپیاودەكات.

*ئەگەر پیاوێك بینی میزدەكاتو میزەكەی بوە بەشیر سروشتیو پاكی لەدەستدەدات.

*ئەگەر مرۆڤێكی ناسراو میزەكەی خواردەوە لەماڵێكی حەلاڵ خێری پێدەكات.

*ئەوەی ببینێ میزەكەی بوە بەخوێن ئەوا لەكاتی خولی مانگانەدا دەچێتە لای ژنەكەی.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم میزم دەکردو میزەکەم خوێنبوو، ئەویش پێی دەڵێت: لەخوا بترسە کابرا ، تۆ لەکاتی خولی مانگانەدا دەچیتە لای ژنەکەت، پیاوەکەش دەڵێ: راستە وایە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر خاوەنی ئەم جۆرە خەوە هاوسەرەکەی دووگیانبوو منداڵەکەی لەباردەچێت.

*ئەگەر بینی خوێن لەمیزەڵدانی دێت یان ئازاری پێدەگەیەنێت دەچێتە لای ژنێکی تەڵاقدراو یان ژنێکی مەحرەم بێئەوەی بزانێت.

*ئەگەر میزەکەیبوو بەزافەران کوڕێکی ناتەواوو نەخۆشیدەبێت.

*ئەگەر بینی میزەکەیبوە بەشەربەت لەخەرجی ماڵو داراییدا زیادەڕەویی دەکات.

*ئەگەر بینی میزەکەیبوە بەخاك یان قوڕ پیاوێکە باش دەستنوێژ ناگرێو دەستنوێژیش هەڵناگرێت.

*ئەگەر میزەکەی بوبوو بەئاگر کوڕێکی درۆ جەردەیدەبێت.

*ئەگەر میزەکەی دڕندەیەکبوو کوڕێکی ستەمکاری دەبێت.

*ئەگەر میزەکەی ماسیبوو کچێکیدەبێت.

*ئەگەر باڵندیەکبوو کوڕێکی شیاوو لەباری دەبێت باشیو خراپیشی دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئەو باڵندەیە.

*ئەوەی بەپێوە میز بکات بەنەزانی ماڵوداراییی دەبەخشێ.

*ئەوەی میز لەکراسەکەیدا بکات کوڕێکی دەبێتو ئەگەر هاوسەرداری نەبێت ژندەهێنێت.

*ئەگەر وای بینی میزدەکات لەلووتیدا دەچێتە لای مەحرەمێك.

*پیاوێك هات بۆلای (ئیبن سیرین)و وتی: ژنێکی خزمم بینی وەك ئەوەی لەنێوان هەردوو مەمکیدا دەفرێك شیر هەبێتو هەرکات بەرزیدەکردەوە بۆخواردنەوە میز زۆری بۆ دەهێناو پەلەیدەکردو دەچوو بۆ میزکردن، ئەویش وتی: ئەو ژنە موسوڵمانو ساڵحەو لەسەر سروشتی پاك ماوەتەوەو حەزی لەشوەو بەڵکو مێردێکی بۆ بدۆزنەوە.

*باوکی (ئەردەشیر)ی کوڕی (ساسان) کەشوانی مەڕبوو لەخەودا بینی میزدەکاتو لەمیزەکەیەوە هەڵمێکی گەورەو زۆر بڵاوبووەوەو ئاسمانی داپۆشیو ئەویش لە(بابك)ی پرسیو

لەوەلامیدا وتی: بۆت لێك نادەمەوە هەتا ئەو كورەت كەلەدایكدەبێت نەیكەیت بەكورم، كاتێ كورەكەی دایە وتی: كورێكی پلەوپایەدارت دەبێتو ناوبانگی دینا داگیردەكات، پاشان (ئەردەشێر)ی بوو دای بە(بابك)ی خەولێكدەرو بەلێنەكەی بەجهێناو هەر بۆیە دەوترێت (ئەردەشێری كوری بابك).

*یەكێكیتر بینی لەخەودا میزدەكات بەكۆرو كۆمەلێكدا لەبازاڕ دواتربوو بەژمێریارو بەرپرسی ئەوبازاڕە.

(نابلسی) دەلێت: میزكردن لەخەودا مالوداریی بەخشینە بەچەشنی نادروست یان جووتبوونی نەشیاوو بەفیرۆچوونی رزق و رۆزیو خالیبوونەوەی گەدەیە، میزگیرانیش یان بەئەستەم میزكردن دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر پەلەكردنی لەكاروبارەكانیداو نەپێكانی چونكە میزگیراو بڕیارەكانی جێگیر نییەو تا لەو بارە قوتار نەبێت، دەگونجێت دەروازەكانی لێبگیرێ.

*ئەوەی ببینێ لەمالی خەلكیدا میزدەكات یان لەگەرەكێكدا یاخود مزگەوتی كۆمەلێك یان شارو گوندێك بەوێدا هاوسەرگیری ئەنجامدەداتو دەبێت بەخزمیان.

*ئەگەر میزكردن لەمزگەوتدابوو پەروەردگار كورێكی خواناسی ئاینپەروەری پێدەبەخشێ.

*ئەوەی ببینێ میزدەكات لەكەمۆلەو شووشەیەكدا یان گۆزەلەو بیرێكی نادیار ژنێك مارەدەبڕێ.

*ئەوەی ببینێ میز لەدەریایەكدا دەكات مالوداریی دەبرێت بۆ فەرمانرەوا.

*ئەوەی ببینێ میزەكەی بوە بەكرم منالەكانی بلاودەبنەوە.

*ئەوەی ببینێ لەعەورەتیەوە قەلەم دێتە دەرەوە كورێكیدەبێت كەپشكو بەشی لەهەموو زانیارییەكدا دەبێت.

*ئەوەی ببینێ لەمیزەلدانیەوە مار دێتە دەرەوە كورێكی دەبێتو دەبێت بەدوژمنی.

*ئەوەی ببینێ میزێكی زۆردەكات یان پیسدەبێت بەو میزە یاخود میزەكەی بۆنێكی ناخۆشی هەیە یان میزدەكاتو خەلكی تەماشای دەكەن دەركەوتنی باروحالێكە ئابرووی دەشكێنێو غەمو پەژارەی بۆ دروستدەكات.

*میز خواردنەوە بەلگەیە لەسەر شایەتیدان لەسەر كاروكاسبی یان مالوداریی حەرامو نارەحەتیو مەینەتی چونكە بەتەنیا لەكاتی نارەحەیتدا بەكاردێت.

**میزەچورکە :** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەشبەشکردنی پارەیە بۆ قەرزدار.

**میسك :** (ئیبن سیرین)دەڵێت: میسكو هەموو بۆنێكی خۆش وەك مێخەك خۆشحاڵیو شادییەو شكاندنی پیاهەڵدانی باشە، ئەگەر كاتێ بڵاوكرایەوە بۆنێكی خۆشنەبوو بەڵگەیە لەسەر چاكەیەك سوپاسی لەسەر ناكرێ.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر خێركردن بەنهێنیو منداڵخستنەوە.

*دەگونجێت بۆ مردوو بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی لەبەهەشتدایە.

*دەگونجێت میسك بەڵگەبێت لەسەر بازرگانییەكی بەسوودو قازانج بۆ خاوەنەكەی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر موڵكی باش سوودو قازانجی لێدەكات یاخود زانیارییكی دەگمەنو بەنرخە.

*ئەگەر میسكی خستەسەر ئاگر وەك عەنبەر بیدعەیەكی لەئاینەكەیدا دروستكردوە یان ماڵو سامانو شكۆمەندی لەلایەكدا بەسەردەچێت شوێنی خۆی نییە.

*میسك خۆشەویست یان كچ یاخود كورە یان ژنە، ئەگەر دزێك هەڵیگرت دەستگیردەكرێ چونكە بۆنیخۆش گوزارشت لەخاوەنەكەی دەكاتو كاری نادیار دەخاتەروو.

*میسك بەڵگەیە لەسەر ماڵوسامان، هەروەها بەڵگەیە لەسەر خۆشنوودیو خێر بۆیەكێك بۆنیبكات یا ببێت بەخاوەنی، هەروەها بەڵگەیە لەسەر پاكێتی تاوانبار.

**میكائیل ( سەلامی خوای لێبێت ) :** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر (میكائیل)ی بینی داواو خواستی لەهەردوو دنیادا بەدەست دەهێنێت، ئەگەر خواناسبوو، ئەگەر خواناسنەبوو باورياو زرنگبێت.

*ئەگەر لەشارو گوندێكدا بینی بارانی بەرحمەتیان بۆ دەبارێتو نرخ دادەبەزێو هەرزانی بڵاودەبێتەوە.

*ئەگەر قسەی لەگەڵ خەوبینەرداكرد یان شتێكیدایە نازو نیعمەتو خۆشحاڵی لەلایەن فریشتەی سۆزو میهرەوە بەدەستدەهێنێ.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی (میكائیل) بەڵگەیەلەسەر رزقو رۆزیو هاتنی فەرو بەرەكەتو نەشونمای كشتوكاڵو زۆری باران.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر گوێبیستی باڵندە.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر:

+گەنجینەوانێکی ئەمین و دەستپاك.
+پادشاو فەرمانڕەوای بەسۆزو بەزەیی بۆ ژێردەستەکانی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بێپیتی و نەبوونی ناو.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+دووگیانبوونی ژنی نەزۆك.
+ئاسانبوونی کاری قورس وگران.
*ئەگەر گەشتیارو موسافیرێك لەدەریادا بینی ترسی لەدەورە یاخود گەر گەشتیاری وشکانیبوو لەوانەیە سەفەرو گەشتەکەی پەکی بکەوێت چونکە بەرپرسی بارانەو بارانیش جموجووڵ دەوەستێنێ.
*بینینی بۆئەوەی زەرەر لەباراندەکات غەم و پەژاریەو بۆ کشتیاران رزق و رۆزیو سوودو قازانجە.
*ئەگەر چوەسەر شێوەی (میکائیل) فەرپیت و ماڵ و سامان و باشی ژیان بەدەستدەهێنێت.

**مینا**[1]: (نابلسی) دەڵێت: ئەوەی خۆی لەوێدا ببینێ دڵنیادەبێت لەوەی کەدەترسێ و دەیکات بەویست وخوازی خۆی و ئەوەی لەدنیاو قیامەتدا ئاواتەخوازیەتی.

**میوان**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا مژدەیە بەپێدانی کوڕێك، ئەگەر میوانەکان بینیان ئافرەتی دووگیانی نییە رزقێکی خێرای دەستگیردەبێت.

**میوانخانە**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: میوانخانەو شوێنی جێنشینی مرۆڤ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ماڵ و خانوەکەی بەڵگەیە لەسەری.
*میوانخانەی نادیار بەڵگەیە لەسەر سەفەر.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لانەی دنیا چونکە لانەی سەفەرەو دەڕوات لێی و کەسانێکیتر جێگەی دەگرنەوە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر باجگری.
*ئەگەر بینی دەچێتە نێو میوانخانەیەکی نادیارەوە دەمرێت، ئەگەر نەخۆشبێت یاخود لەشوێن و جێگەیەکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ شوێن و جێگەیەکیتر، بەلاّم ئەوەی لەمیوانخانەیەکەوە بچێت بۆ میوانخانەیەکیتر سواری ولاّخ یان ئوتومبیلەکەی ببێت لەوکاتەدا یاخود بەهۆی ئوتومبیل و ئاژەڵێکەوە لەناوەڕاستی بچێتە دەرەوە تەماشای حاڵ و باری دەکرێت، ئەگەر نەخۆش بێت دەخرێتە سەر شان و ئەگەر

---

[1] **مینا**: شوێنێکە لە(مەککە)یە. (وەرگێڕ)

لەسەفەردابێت دەکەوێتە جوڵەو سەفەر دەکات لێوەی.

*هەروەها ئەگەر هاوەڵانی بینی لەمیوانخانەیەکی نادیار لایاندابوو دەبێت بەدەردو نەخۆشی بۆ خەڵکی یاخود دێتە دەرەوەو جیاوازیدەکات لەنێوان دووهاوەڵدا.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا میوانخانەیەکی بینی ئامادەکرابوو بۆ بەکرێدان بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری کاتی(متعە)، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ئەو ماڵو خانوو ئوتومبیلو ئاژەڵەکەی بەکرێ دەگیرێ یاخود زەویو جلوبەرگی بەکرێگیراووخوازراو.

*میوانخانەکانی سەرە ڕێش ئەگەر لایدا لێیو نەخۆش بوو دەمرێت، دەگونجێت غەمو پەژارەی بڕەوێتەوەو دوای ڕەبەنیو تەنیایی هاوسەربگرێو، خوداوەند ئوتومبیلو ئامرازی گواستنەوەی بۆ فەراهەمبکات یان منداڵێك بدۆزێتەوەو هاوکاریو یارمەتی بدات لەسەر ڕەنجو ماندوبوون.

*ئەگەر خەوبینەر هاوسەرداربوو خوداوەند کوڕێکی پێدەبەخشێ یارمەتیدەدات لەپیشەو کارەکەیداو پشوودەدات، ئەگەر سەرپێچیکاربوو تەوبەدەکاتو ئەگەر وێڵو سەرگەردانبوو ڕێنوێنیدەکرێو باوەڕو ڕێنومایی وەردەگرێت.

**میوانداری:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: میوانداری کۆبوونەوەیە بۆ کارێکی خێرو باش، ئەگەر بینی کۆمەڵێك بانگدەکات بۆ میوانداری خۆیدەکات بەنێو کاربێکدا پاشان سەرزەنشتو پەشیمانی لێبەدەستدەهێنێت بەپێی چیرۆکەکەی (سولەیمان) (سەلامی خوای لێبێت) کاتێ لەخوداوەند داوایکرد بژێوی بەندەو دروستکراوان بۆ ماوەی ڕۆژێك بدات بەلاَم نەیتوانی تەواوییکات.

*ئەگەر بینی کۆمەڵێکی بانگکرد بۆ میوانداریتیو خواردن هەتا تێریانخوارد ئەوجا سەرۆکایەتیان دەکات.

*هەروەها دەڵێن: میوانداریتی بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی کەسێکی ئاوارە.

*ئەگەر بینی بانگکراو بۆشتێکی نادیارو میوەیەکی زۆرو خواردنەوەی تێدابوو بانگدەکرێ بۆ جیهادو شەهید دەکرێ بەپێی ئایەتی: ﴿ يَدْعُونَ فِيهَا بِفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴾(ص:٥١).

**میوە:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا هاوسەرگیرییە بەپێی ئایەتی: ﴿فَاكِهُونَ (٥٥) هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ ﴾ (یس : ٥٥ ـ ٥٦).

*ميوەی تەڕ ڕزقێکە نامێنێتەوە چونکە بەخێرایی خراپدەبێ‌و هی وشکیش ڕزق‌و ڕۆزییەکی زۆرە دەمێنێتەوە.

*هەروەها دەڵێن: میوە بۆ هەژارو دەوڵەمەند زیادبوونی ماڵ‌و سامانە.

*ئەگەر بینی میوە دەکڕێ بەسەریا بەچاکەو خێر ناوبانگدەردەکات.

**میوەفرۆش:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پیاوێکی ئەسینە لەسەر ماڵ‌و سامانی خەڵکی‌و نهێنیان‌و لەلێکدانەوەدا باشە ئەگەر چنگ نەکات بەمیوەدا.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر وانەوتنەوەی بەسوود یان هەواڵگەری فەرمانڕەواو هاوسەرو ماڵێکی خێراو سوودێکی دوابڕ.



**مێخ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی لەسەر دیوار یان زەویدا لێیدا ئەگەر ڕەبەنبوو هاوسەردەگرێ، ئەگەر هاوسەرداربوو دووگیاندەبێت لێی.

*ئەگەر خۆی لەسەربەوە بینی زاڵدەبێت بەسەر زانایەکدا یاخود بەسەر چیایەکدا دەڕوات.

*هەروەها دەڵێن: مێخ میرێکە دووڕوویی تێدایە، ئەگەر بینی لەدیوارێکدا ڕواندی پیاوێکی ڕێزداری خۆشدەوێت.

*ئەگەر لەدیواری ماڵێکدا چەقاندی ژنێکی خۆشدەوێت، ئەگەر لەدیوارێکدا چەقاندی‌و لەتەختەبوو منداڵێکی دووڕووی خۆشدەوێت.

*ئەگەر پیاوێکی بەتەمەنی بینی مێخێکی لەپشتیا چەقاند لەپشتی پادشاو سەرکردەو هاوچەشنی دەردەکەون.

*ئەگەر لاوێکی بینی مێخێکی تەختەی لەپشتیدا چەقاند کوڕێکی دووڕووی دەبێت دوژمنی خۆیدەبێت.

*ئەگەر مێخەکەی هەڵکێشا لەلێواری مردن نزیکدەبێتەوە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا پادشا یان هاوتایەتی ئەگەر مێخێکی لەدیوارێکدا چەقاند پیاوێکی پلەوپایەداری خۆشدەوێت.

*ئەگەر مێخی لەماڵێکدا چەقاند ژنێکی خۆشدەوێت.

*ئەگەر مێخێکی تەختەی، چەقاند منداڵێکی دووڕووی خۆشدەوێت.

*ئەگەر مێخ لەئاسنبوو ماڵ‌و سامان‌و هێزە.

*مێخ بەڵگەیە لەسەر ئێش‌و ئازار بەهۆی تیژییەوە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارە بەهۆی تۆکمەیی‌و بەهێزی.

*ئەگەر بینی لەئامرازی نێرینەی (١٢) مێخ هاتەدەرەوە خۆشی لەدوانگەکەدابوو لەمزگەوت (١٢)کوڕیدەبێت‌و دەبن بەپێشەنگ‌و نمانای بەرز.

*کۆمەڵە مێخێك زیانە، هەروەها مێخ بەڵگەیە لەسەر:
+پلەوپایە.
+خۆڕاگرتن لەسەرکاروبار.
+خەشمو قین.
+دانانو کار پێسپاردنو لابردن.
+سەفەر.
*ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر کوڕ یان هاوسەر بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی.
*ئەگەر خۆی لەسەر مێخێك دییەوە زاڵدەبێت بەسەر زانایەکدا، گوتراویشە بەسەر چیایەکدا هەڵدەزنێ.
*هەروەها دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر:
+ماڵو سامان.
+عیشق.
+غەمو پەژارە.
**مێروولە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: مێرووڵەی زۆر سەربازەو بینینی لەسەر جێگە منداڵە.
*بینینی مێروولە بەڵگەیە لەسەر نەفسی خەوبینەر.
*هەروەها گوتراوە: بەڵگەیە لەسەر خزمەکانی.
*هەروەها دەڵێن: هاتنە دەرەوەی مێروولە لەکونەکانی غەمو پەژارەیەو کەوتنی بەسەر نەخۆشدا مردنیەتیو زانینی زوبانی مێروولە دەستەڵاتە بەپێی چیرۆکەکەی (سولەیمان) (سەلامی خوای لێبێت).

*ئەگەر بینی مێروولە دەچێتە نێو ماڵەکەی بەخواردنەوە خێری ماڵەکەی زیاد دەکات.
*ئەگەر بینی مێروولە لەماڵەکەی دێتە دەرەوە هەژار دەکەوێت.
*هاتنەدەرەوەی مێروولە لەلووتو گوێچکەو ئەندامیتر بەڵگەیە لەسەر مردنی خەوبینەر بەشەهیدی، ئەگەر خۆی بینی خۆشحاڵەپێی، ئەگەر بینی ناخۆشبوو هاتنەدەرەوەی ترسی هەیە.
*مێروولە مرۆڤێکی لاوازی پشتئەستووره زۆریشی سەربازە یان تەمەندرێژییە.
*ئەگەر مێروولەی بینی چوە گوندێك سەرباز دەچنە ئەو شارەوە، ئەگەر لێی هاتنەدەرەوە دوور دەخرێنەوەلێی.
*ئەگەر بینی مێروولە لەماڵو شارێك هەڵهاتوە دز لەو شوێنە شت دەبەنو لەوێدا ئاوەدانی دەکەوێتەوە چونکە مێروولەو ئاوەدانی بەیەکەوە نایەن.
*زۆری مێروولە لەوڵاتێکدا زەرەرگەیاندنە بەخەڵکی ئەو وڵاتە، مێروولەش دزو بژێوی پەیداکارە.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی لەشوێنێکەوە دەفڕێو نەخۆشی تێدایە دەمرێ یاخود لەو شوێنە سەفەر دەکاتو ناڕەحەتی تووشدەبێ.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر فەرپیت.

*ئەگەر مێرولەیەکی زۆری لەماڵو گەڕەکێکدا بینی ژمارەی خەڵکی ئەو ناوچەیەو وەچەیان زیاددەکات.
*ئەگەر بینی لەماڵێك یان گەڕەکێك دێنە دەرەوە خانەوادەکەی مردنو راگوێزان روویان تێدەکات.
*ئەگەر مێروولە باڵی پەیداکرد بەڵگەیە لەسەر تیاچوونی سەربازێکی زۆرو بێشومار.
*هاتنەدەرەوەی مێروولە لەلووتو گوێچکە یان ئەندامەکانیترو دڵخۆشبوون پێی بەڵگەیە لەسەر مردنی خەوبینەر بەشەهیدی، ئەگەر غەمو پەژارەداربوو دەمرێ بەبێ تەوبە.
*ئەگەر بینی مێروولەیەکی کوشت بەهۆی کۆمەڵێکی لاوازەوە گوناهو تاوان ئەنجامدەدات.
*ئەگەر گوێی لەگوتەی مێروولەبوو و شایستەی دەستەڵاتبوو بەدەستی دەهێنێ، وەگەرنا فەڕوپیتو خێری دەستگیردەبێت.
*مێروولەی گەورە بۆ تێکۆشەران کوشتنیانەو بۆ نەخۆش مردنیەتیو بۆ ئەوانەی دەیانەوێت سەفەربکەن ماندوبوونو زەرەرە.
*ئەگەر مێروولەیەکی گەورەی بینی لەماڵەکەی بارێکی هەڵگرتو هاتەدەرەوە ماڵو سامانی دەدزرێو کوڕوبراکەی خێری پێدەکەن.

**مێروولەی سوور:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا مێروولەی سوور ئامادە دەکات یاخود دەبیات بەڵگەیە لەسەر ستەمو فیتنە ئەنجامدان.
*ژمارەی مێروولەی سوور بەوەچەوە لێکدەدرێتەوە، سەربازیش بەماڵو تەمەندرێژی.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر خەڵکی بێنەواولاواز.
*هەروەها دەڵێن: مێروولەی سوور سەربازی خوداوەندن.
*مێروولە ئەگەر خۆیکرد بەشوێنێکداو سروشتی خۆی وانەبوو بەڵگەیە لەسەر زانیاریو ماڵ کەبەهیچ شێوەیەك ئەژمەردە ناکرێ.

**مێزەر( مەندیل ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: مێزەربەستن بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەو هێزو دەستەلات.
*ئەگەر بینی مێزەری پێچا بەسەریەوە سەفەرێکدەکات بەشکۆمەندیو لای خەڵکی باسدەکرێ.
*ئەگەر بینی مێزەرەکەی مێزەرێکی تری خرایە سەر پلەوپایەی زیاددەکات.
*مێزەری ئاوریشم بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەو تێکچوونی ئاینو ماڵی حەرام.
*ئەگەر مێزەرەکە لەلۆکەوخوریبوو پلەووپایەی ئاینو دنیایە.
*ئەگەر لەئاوریشمبوو دەوڵەمەندیو جلوبەرگی رەنگاورەنگە.

*(ئەبوموسلیمی خوراسانی) لەخەودابینی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) مێزەریکردەسەرو رەنگی سوربوو بۆی پێچایەوەو بیستودووگرێی لێدا، ئنجا خەوەکەی بۆ راڤەکارێك گێرایەوەو ئەویش وتی: بیستو دوو ساڵ فەرمانرەوایدەکەیت بەستەمکاریو خەونەکەش لەواقعدا هاتەدی.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا تاجی پیاوی شکۆمەندی دەستەڵاتدارە یان هێزو هاوسەرە.

*ئەگەر فەرمانرەوایەك بینی مێزەرەکەی داگیرا پۆستو دەستەڵاتەکەی لادەبرێ.

*هەروەها ئەگەر مێزەرەکەی لەسەر داگیرا بەهەمان شێوەیە، ئەگەر فەرمانرەوانەبوو هاوسەرەکەی تەلاقدەدات یان ماڵو شکۆمەندی بەسەردەچێت.

*ئەگەر بینی فەرمانرەوایەك مێزەری کردەسەری یا دەستەڵاتێك دەگرێتەدەست یاخود لەترسا ژنێکدەهێنێ.

*ئەگەر بینی پێغەمبەرێك مێزەریکردەسەر یان دەستەڵاتدارێکی زیندو یامردوو خۆشی مێزەربەسەربوو دەستەڵات وەردەگرێو مێزەریش سەرکەوتنە.

*ئەگەر بینی مێزەرێکی بەستوە تواناو دەستەڵاتو ماڵو سامانی زیاددەکات.

*ئەگەر مێزەرێکی بەست بەسەرمێزەرەکەیدا پلەوپایەو شکۆمەندی زیاد دەکات.

*مێزەری زەرد نەخۆشییەو رەشیش پلەوپایەیە.

*ئەگەر فەرمانرەواو دەستەڵاتدارێك بینی مێزەرەکەی وەك ماڵێك یان ئەموستیلەکەی وەك پاوانەیە لەپۆستی دەستەڵات لادەبرێ.

*دەگونجێت دەستەواژەی مێزەر لەکوێریەوە هاتبێ یان غەمو پەژارەیەکی گشتییە.

*ئەگەر لەخەودا نوێژێکی بەبێ مێزەرکرد گومانی دەبێت لەدەستنوێژو چەمانەوەو کرنووشەکەیدا.

*ئەگەر یەکێك لەموشریکانی بەدیکرد مێزەرێکی بەست موسوڵماندەبێ.

*ئەگەر لەفەرمانرەوایەك ترساو لەخەودا بەمێزەرێکی جوانەوە بەدیکرد بەزەیی پێدا دێتەوەو لەشەری دڵنیادەبێت.

**مێش**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: مێش پیاوێکی لاوازی زمان پیسی هیچو بێنرخەو رزقو رۆزی پیسو حەرامە.

*ئەگەر بینی مێشێك خۆیدەکات بەدەمیا لەگەڵ خەڵکی سووكو رسوادا تێکەڵدەبێتو ماڵو سامانێکی حەرامی لێیانەوە دەستدەکەوێو نامێنێتەوە لای.

*کۆمەڵـە مێـشێکی زۆر دوژمنێکـی بەزیانە، بەڵام ئەگەر کەسێکی موسافیر بینـی مێـشبەسەریەوە دەنیـشێتەوە دەترسـێ ڕێگـەی لێـبگیرێو ڕووتـی بکەنـەوەو مـاڵو دارایـی ببـەن بـەپێی ئایەتی: ﴿ وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ﴾ (الحج: ٧٣)، هەروەها ئەگـەر مێشکەوتەسەر شتێك ماڵەکـەی دەگەیـەنێت ترسا لـەوەی دز ببیەن.

*هـەروەها دەڵـێن: ئەگـەر مێـشێك بکوژێت لەشاساغیو تەندروستی باش بەدەستدەهێنێت.

(نابلـسی) دەڵێـت: ئەگـەر سـوودی لێوەرگرت سوود بەپیاوێك دەگەیەنێت.

*ئەگـەر خـواردی ڕزقو ڕۆزی خـراپ بەدەسـتدەهێنێت ئـەوەی دەیکاتـە نێوگـەرووی مـاڵی پیـاوێکی خـراپو ناقۆڵایە.

*ئەگەر بینی مێش دەفڕێت بەسـەریا دوژمنێکـی لاوازی هەیـە، دەیـەوێت زاڵبێت بەسـەریا لەڕێگـەی سـەرکردەو فەرمانڕەواکـەی کەبـەگوێیان دەکـات بەڵام ملکەچ ناکاتو ناترسێ.

*ئەگـەر بینـی مـێش یـان مێـشوولە دەچـێتە نێـو گوێـچکەی خێـرو فـەڕو مەزنیو دەوڵەتداری بەدەستدەهێنێت.

*مـێش دوژمنێکـی سەرسـەختو سوپایەکی لاوازە.

*دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر کۆبوونەوەیان لەدەوری ڕزقێکی چاكو باش.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+دەرمـانو چارەسـەر بـۆ یـەکێك نەخۆشبێت.

+کرداری خراپو نالەبار.

+کەوتنەکارێکەوە.

**مێشك( دەماخ )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: مێشك بەڵگەیە لەسەر ئـەقڵو ژیری ، ئەگەر بینی مێشکێکی گـەورەی هەیـە بەڵگەیە لەسەر بەرینیو فراوانی ئەقڵی.

*ئەگـەر بینـی مێـشکی نییـە بەڵگەیـە لەسەر نەزانینو کەم ئەقڵی.

*هەروەها دەڵێن: مێشكو ئەقڵ ماڵێکی دەگمـەنی هـەڵگیراوو پـاكو پوختـە، ئەگـەر بینـی خەریکـە مێـشکی خـۆی دەخـوات یـاخود مـۆخی هەنـدێك لەئەندامەکانی ماڵەکەیدەخوات.

*هەندێکـدەڵێن: خـواردنی مێـشکی مـردوو مـەرگی خێـرا دەهێنێـت، ناوچـەوانیش مـاڵو شـکۆمەندییە، هـەروەها دەڵـێن: خەوبینـەر ژنێـك دەهێنێـت جوانییەکـەی بەئەنـدازەی جوانی ئەو نێوچاوانەیە کەبینیویەتی.

(نابلـسی) دەڵێـت: مێـشك بەڵگەیـە لەسـەر ئـاینو بۆچـوونی دڵو کاروکرداری نهێنی.

**مێشکوژ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەلگەیە لەسەر پیاوی خراپو نەزان لەگەڵ پیاوی خۆشەویست.

**مێو:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا شکۆمەندییە بۆ یەکێك بیبینێ، هەموو دارێکیش هەر بەو چەشنەیە.

*مێو بەژنێکی دەوڵەمەند راڤە دەکرێ ئەگەر شووڵە مێوی هەڵگرت ماڵو سامانی لەژنێکی رێزدارەوە دەستگیر دەبێت، هەروەها دەڵێن: پیاوێکی بەخشندەیە.

*ئەگەر مێوێکی بینی لەزستاندا ترێی گرتوە بەژنێك لێکدەدرێتەوە ماڵو سامانی رۆییوەو وادەزانێ هەر دەوڵەمەندە، ئەگەر لەدارمێوەکە ترێی لێکردەوە ماڵو سامانی خەرجدەبێ بەئەندازەی لێکردنەوەی ترێ.

*ئەگەر مێوو گەڵامێوی دی سوود وەردەگرێ لەکۆمەکی ئاینو گوێڕایەڵی.

*دارمێو بەلگەیە لەسەر هاوسەرگیری بەهۆی تێکەڵیو چوون بەنێویەکی رەگەکانیدا.

*کەپری مێو ژنێکی شۆخو شەنگی دەوڵەمەندە خاوەن بەردەستو خزمەتکارە، هەروەها باخی ترێش هەر بەوچەشنەیە.

*ئەگەر ترێی بینی لەسەر سەری روا دومەڵو برین لەسەریدەردێت.

**مێوژ:** لەخەودا رزقو رۆزی بەسوودە لەهەر رەگەزو رەنگێکبێت رەش یا سوور یاخود سپی.

**مێشوولە:** (نابلسی) دەڵێت: مێشوولە لەخەودا دوژمنی خوێنمژە کەلەشو لار ناشیرین دەکات ، دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر شەڕو بێبەشبوونو قورسی حاڵوبار بۆئەوەی لەئاستی سنگەوە رووی تێدەکات.

**مێشوولەوردە:** (نابلسی)دەڵێت: ئەوەی لەخەودا ببینێ ماڵو سامان بەدەستدەهێنێت بەهۆی هاتنەدەرەوەی خوێن.

# نون



## ن ا

**نائومێد:** (نابلسی) دەڵێت: نائومێدبوون لەسۆزوبەزەیی خوایی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هاوەڵپەیداکردن یان کوشتنی کەسێك بەناحەق یان کەوتنەکاری ناڕەواو دەرەنجامەکەشی بەباشە کۆتایی دێت.

**نائومێد بوون لەشتێك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: نائومێدبوون لەکارێك بەڵگەیە لەسەر قوتاربوونو رزگاری بەپێی ئایەتی: ﴿لَمَّا اسْتَيْأَسُوا مِنْهُ خَلَصُوا نَجِيًّا﴾(یوسف: ٨٠) وئایەتی: ﴿حَتَّىٰ إِذَا اسْتَيْأَسَ الرُّسُلُ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا جَاءَهُمْ نَصْرُنَا﴾ (یوسف:١١).

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی نائومێدبوو لەسۆزو بەزەیی خوا کاری دۆزەخیەکان ئەنجامدەدات.

**ناپاکی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا کەموکورییە لەئاینو دنیادا، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دزیو پێیستبوون بەغەدر لێکراو بەپێی چیرۆکی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت).

*لەخاوەنی ماڵو دارایییەوە بەڵگەیە لەسەر هەژارییان، هەروەها ناپاکیو خیانەت بەڵگەیە لەسەر زینا.

(ذابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پاشگەزبوونەوە لەئاین بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) : "ئەوەی ناپاکیو خیانەت بکات لەئێمە نییە".

**ناتری حەمام:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی بۆ نەخۆش بەڵگەیە لەسەر مردوشۆرو بەڵگەشە لەسەر رەواندنەوەی غەمو پەژارەو دانەوەی قەرزو تەوبەکردنی سەرپێچیکارو باوەڕهێنانی بێباوەڕ.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر پاکێتیو قەرزدانەوە، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی لەدەرکی دەستەڵاتداران دەوەستێ بۆبەجێهێنانی پێداویستیەکی خەڵکی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زیندانەوان.
* ناتر لەمزگەوتدا خزمەتکارە بۆئەوەی مزگەوت بەڵگەیە لەسەری.
* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر تەوبەو پەشیمانی لەگوناهو تاوان‌و باشی حاڵ‌و بار.
* ناتری حەمام لەبازاڕو کەنیسەدا بەڵگەیە لەسەر تیاچوونی ماڵ‌و ڕۆچوون لەکرداردا یاخود تێکەڵبوون لەگەڵ ئارەزووبازان.
* بینینی ژنی ناتر لەحەمامدا بەڵگەیە لەسەر مێردی هەژار ئەگەر ڕەبەنبوو.

**ناتوانایی سێکسی:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: کەسێك توانای کاری سێکسی نەبێت دنیانەویستەو هیچ ناوبانگێکی لەدنیادا نابێ.
* ئەگەر ئەو ناتوانییەی ڕەویەوە دەستەڵات‌و ناوبانگدەردەکات.
* هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی ژنێکی هێنا یان کچێکیهێنا نەیتوانی جووتببێت لەگەڵی بەهۆی ناتوانایی سێکی بازرگانیەك بەبێ سەرمایە دەکات.

**ناتەواوی‌و عەیب:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ڕەوشتی خراپ‌و ڕەوشتی نالەبار.

**نارنج:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا شەڕە یان فیتنەیە، ئەگەر کۆمەڵێکی بینی ریزیان بەستوە بەدووی یەکداو نارنجیان پێیە کوشتاری یەکدیدەکەن.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەرئەوەی هەڵهاتن‌و قوتاربوون دەهێنێت .
* دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر خۆشەویستی‌و ئالوودەبوون.
* زۆری نارنج لەماڵدا بەڵگەیە لەسەر هەڵگیرسانی ئاگر تێیدا، هەروەها بۆ کەسێکی ڕەبەن بەڵگەیە لەسەر هاوسەری جوان‌و شۆخ‌و شەنگی خاوەن ماڵ‌و سامان.

**ناساغی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پەکخستنی سەفەرو نان‌و بژێوی پەیداکردنە بەدەست‌و قاچ.
* نەتوانینە لەبەدەستهێنانی ویستوخوازدا.

**ناعور ( ئاوسەرخەر گەردوونی ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پارێزەرێکە ماڵ‌وسامانی خەڵکی بەنهێنی دەپارێزێ. هەروەها گوتراوە ناعور گەڕانی بازرگانی‌و ماڵ‌وسامانەو گواستنەوەو گۆڕانی حاڵە لەسەفەردا.

**ناکۆکی ( ئاژاوە ):** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی لەخەودا ناکۆکی هەبوو لەگەڵ مرۆڤێکدا غەم‌و پەژارەیەکی توند ڕووی تێدەکات.
* ناکۆکی‌و ئاژاوە ئاشتبوونەوەیە ئەگەر بینی ناکۆکە لەگەڵ نەیارێکدا ئاشتیدەکاتەوە.

(نابلسی)دەڵێت: ناکۆکی لەنێوان دوو نەیاردا ئاشتییە بۆ نوێژ خوێنانیش غەم‌و پەژارەو فیتنەیە.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر بەتاڵکردنەوەی کاروکردار.

*ئەگەر بینی ناکۆکی لەگەڵ فەرمانڕەوایەکدەکات شادیو دڵخۆشیو سەرکەوتنو هێزدارییە.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر ناکۆکیو دەمەدەمە سەبارەت بەئایەتو نیشانەکانی پەروەردگار.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر زوڵمکردن لەخەڵکی ناموسوڵمان.

**ناڵەناڵ:**(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بۆ ژن ژانە.

**نامە:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا مرۆڤ ناردی بۆ کەسێك یاخود لەلایەن کەسێکیترەوەو پێیگەیشت بەلگەیە لەسەر پلەوپایەیەکی بەرزو وشەیەکی ئەگەر لەخەودا رایگەیاند، بەلام ئەگەر ناردی بۆ لایەنێکی دیاریکراو ئەگەر خێری تیابوو وەك فەرمانبەچاکە یاخود رێگری لەخراپە بەلگەیە لەسەر بەرزی پلەوپایە، بەلام ئەگەر لەخەودا نامەی پێگەیشت مژدەی تێدابوو بەلگەیە لەسەر دەرەنجامو دووریی باش بۆئەوەی تێدا دەیترسێنێ یاخود رزقو رۆزی بەدەستدەهێنێت یان هاوسەرەی بەنسیبدەبێت، ئەگەر هەڵیکوتایەسەر نامەبەرەکەو لێیدا بەلگەیە لەسەر پاشگەزبوونەوە لەئاینەکەی یاخود بەلگەیە لەسەر بیدعەو وێڵیو سەرگەدانیو دەگونجێت بەکوشتن ژیانی دوایی بێت.

**نامەگۆڕینەوەی نێوان دووتاقم:**

(نابلسی)دەڵێت: لەجەنگدا بەلگەیە لەسەر:

+نزیکی وادەی مەرگ.

+کوژاندنەوەی ئاژاوەو فیتنە.

+شوێنکەوتنی حەق.

+مەرگی نەخۆش.

+سەرخستنی ستەملێکراو.

*ئەگەر مرۆڤێك لەخەودا بوو بەپەیامنێر بەلگەیە لەسەربەرزی حاڵوباری.

**نان:**(ئیبن سیرین) دەڵێت: نان بەلگەیە لەسەر زانیاریو ئیسلام چونکە بناغەی ئاینەو بناغەی روحو دەروونە.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر:

+ژنان.

+ئەو ماڵو داراییەی دەروون پێی ئاسوودە دەبێت.

+قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)و ماڵو دارایی.

+دایکی پەروەرشیار.

+هاوسەری دیندار کەمرۆڤ خۆی پێدەپارێزێ.

*نانی پاكو خاوێن بەلگەیە لەسەر:

+ژنێکی بێخەوشو زانیارییەکی پاكو دروست.

+ژنی شۆخو شەنگی سپی پێست.

*ئەگەر بینی نان دابەشدەکات بەسەر لاوازو زەبوونەکاندا، ئەگەر قوتابیانی زانیاری پەروەردەبێت زانیاری پێویست بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر ئامۆژگاریدەربوو نانە وەك ئامۆژگاری ئەو وایە.
*ئەگەر بینی مردوویەك نانی پێدەدات ماڵو رزقو رۆزییەکە بەدەستی کەسێکیترەوە پێیدەگات یان لەشوێنێکەوە.
*ئەگەر نانی بینی بەسەر هەورەوە یان بەسەربانەوە یاخود لەبەرزاییەکانی دارخورمادا گراندەبێت، هەروەها سەرجەم خواردەمەنیەکان بەو چەشنەیە.
*ئەگەر خۆی بینی لەسەر زەوییەکەو بەقاچی زەوی دەکوتێتەوە خۆشحاڵیو دەوڵەمەندییەکی گەورەیە خۆشیو شادیو ناسوپاسگوزاری بەرپادەکات.
*ئەگەر مردوویەکی بینی نانی ئەو دەبات یاخود لەدەستی کەوتەخوارەوە بۆ ناو ئاگر یاخود بۆ سەرپێشاو یان کەوتە نێو قەترانەوە تەماشای حاڵیدەکرێت ئەگەر لەسەردەمی فیتنەو ئاشوبدابوو بەهیلاکدەچێت یاخود نانەکە ئاینەکەیەتیو لەدەستیدەدات، بەڵام ئەگەر هیچکام لەوانە نەبوو بەڵام هاوسەرێکی نەخۆشی هەبوو دەمرێت، ئەگەر ئاینی لاوازبوو تێکدەچێ.
*ئەگەر میزیکرد بەسەر نان‌دا کەسی یاساغو ناشیاو ماوەو وادە دەبرێت.
*ئەگەر خاوەنی نان پیاوێکی پیرو بەتەمەنبوو لەرێزدارە تۆمارکراوەکانە، ئەگەر لاوێکبوو پیاوێکی کوشتاگەیە.

*ئەگەر بینی نان‌دەکات هەوڵدەدات لەپەیداکردنی بژێویدا بەهۆی سوودێکی بەردەوام، ئەگەر خێرا نانیکرد هەتا تەنورەکە سارد نەبێتەوە دەستەڵاتو فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێتو بەئەندازەی هاتنە دەەوەی نان لەتەنور ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر نانێکی بەدەستهێنا تەمەنیەتی، نانیش چل ساڵە، کەمو کورپییە لەتەمەندایە لەگەڵ پاکیەتیەکەی هی دنیایە.
*هەروەها گوتراوە: یەك نان هەزار درهەمە لەگەڵ فەرو بەرەکەتو رزقو رۆزییەکی ئامادە یەکێکیتر هەوڵی بۆ دەداتو لەدەستیدەچێتو غەمو پەژارە دایدەگرێ بەپێی ئایەتی: ﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيٓ أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ﴾ (فاطر: ٣٤).
*راڤەکاران دەڵێن: غەمو پەژارە نانە، ئەگەر چەن نانێکی زۆری بینی بەبێنەوەی بیخوات چەن برایەکی بەپەلەو کتوپڕ دەبینێ، ئەگەر نانی بەدەستەوەبینی ژینو بژێوییەکی باشە لەگەڵ مامناوەندێتی لەئایندا، ئەگەر جۆبوو ژنێکی خراپە وێرای نەخشەو پارێزکاری بۆی.
*ئەگەر نانێکی وشکبوو سەختیو ناڕەحەتیە لەژیندا دروستدەبێت.
*ئەگەر دەستەوارەیەك نانی پێبەخشراو خواردی بەڵگەیە لەسەر بەسەرچوونی تەمەنو چارەنووس

تیاچـوونی، هـەروەها گـوتراوە: ئـەو خـەوە بەڵگەیـە لەسـەر ژنێکیخـۆش، ئەگـەر پارووێـەکی هـەڵگرت ئـەوە پیاوێکی تەماعبازە.

*نان بۆ کەسی ڕەبەن هاوسەرە، نانی پـاكو خـاوێنو بـرژاو بـۆ فـەرمانڕەوا دادپەروەرییـە، بـۆ بازرگـان دادییـە، بۆپیشەوەر ئامۆژگارییە.

*گەرمی نان دووڕوویی‌و شتی حەرامە.

*ئەگـەر پیاوێـك نـانێکی هەڵواسـراوی بینی بەنێوچـەوانیەوە بەڵگەیـە لەسـەر هەژاری.

*نـانی شـکاو مـاڵو داراییـەکی زۆرە خاوەنەکـەی زەکـاتی نـاداتو سـوودی لێوەرناگرێت.

*نـانی نێـو خۆڵـەمێش تەنگەبـەری بژێوییـە بـۆ کەسـێك بیخـوات چـونکە کەسێکی ناچار ئەونانە دروستدەکات.

*ئەگەر بینی نانـدەخوات بـەبێ پێخـۆر بەتەنیا نەخۆشدەکەوێتو دەمرێت.

*هەروەها دەڵێن: ئەو نانەی نـەبرژاوە بەڵگەیـە لەسـەر تایـەکی تونـد بەهۆی ئـەوەی جـارێکیتر ئـەو نانـە ئامـادە دەکرێت بۆئـەوەی بخرێتـەوە نێوئـاگر هەتا ببرژێت.

*نانی گەرمی دروستکراو لەئاردی سپی بەڵگەیـە لەسـەر کـوڕ، خـواردنی نـانی ڕەق فراوانی ڕزقو ڕۆزییە.

*هەروەها دەڵێن: ڕەقـی نـان کۆشـشو تەلاری تەمەنە.

*نـانی ڕەق سـوودو قـازانجێکی کەمـە زوو بەدەردەکەوێت.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سـیرین)و دەڵێـت: لەخـەودا بینـیم دوونـانی ڕەقـم بەدەسـتەوەبوو هـەر جـارەی لەیـەکێکم دەخـوارد، ئـەویش ڕاڤەی خەوەکەیکردو وتی: تۆ پیـاوێکی دوو خوشك دەکەیت بەهاوسەری خـۆت لەحاڵی ژیانیاندا(یەك لەدوای یەك).

*گونکی هەویر سوودێکی کەمە، نانیش سوودو قازانجێکی زۆرە.

(نابلسی)دەڵێت: نـان لەخـەودا بەچـەن شێوەیەك هاتوە:

١)<u>نانی سـپی:</u> بەڵگەیـە لەسـەر ڕزقو ڕۆزی ئاسـانو ژنێکـی خۆشـنوودو باشگوزەران.

٢)<u>نـانی ڕەش:</u> بەڵگەیـە لەسـەر ناخۆشی ژینو بژێوی.

*هەروەها دەڵێن: هەموو نانێك بەڵگەیە لەسەر (چل) ساڵی تەمەن.

*نـان بەڵگەیـە لەسـەر بڕێـك پـارە دەگونجێت (هـەزار) یا (سـەد) یـاخود دەبێت بەپێی حاڵو باری خەوبینـەرو ئەوەی شیاوە لەگەڵیدا.

*نانی تاڵ ژیانە.

*نـانی خـۆشو بـەتام : نـرخ گرانییـە، ئەگـەر وەك هـەنگوین یـاخود شـەکر وابێـت ، هـەروەها گـەنمیش بـەو شێوازەیە.

*ئەگـەر نـان بەپیـسابیەوە بخـوات هەنگوین بەشانەوە دەخوات.

*باشترین نان نـانی بـرژاوی نێـو فرنـه، نانی نـۆك تـەنگەبـەری‌و بەرزبوونـەوەی نرخە.
*ئەگەر نانی لەشوێنی خۆلْڕشـتن بینـی هەرزاندەبێت.
*نانی گەورەو فـراوان رزق‌و رۆزییـەکی فراوان‌و تەمەندرێژییە.
*نـان بەلْگەیـە لەسـەر رەواندنـەوەی غەم‌و پەژارە.
*گـونکی بـچووك: تەمـەنێکی کـورت‌و رزق‌و رۆزییەکی کەمە.
*نـانی جـۆ: بـۆ یـەکێك رانـەهاتبێت لەســـــەرخواردنی تەنگەبـــــەری‌و بەرزبونـەوەی نـرخ‌و بەهایـە چـونکە لەنەبوونیدا دەخورێت.
*کێك: تەندروستی‌و لەشساغییە.
*نانی بۆگەن و پیس: بەهانەو مۆلْـەت پێدانە، ئەگەر بالْی بـۆ دروسـتبوو رفـی گراندەبێت‌و نرخی بەرزدەبێتەوە.
*نـانی لـەت و شـکاو: فەرووبەرەکـەت‌و بژێوییەکی خۆشە.
*نـان هاوسـەرە یـاخود کـوڕە یـان سالْێکی تەواوە یان درهـەمێك یا سـەد درهەمە.
*هـــەویری هەلْنـــەهاتوو: قەرزێکـــە دەیداتەوە یاخود وەریدەگرێ.
*نـانی وشـك: بـۆ خۆشـگوزەران‌و دەولْەمەنـد بەلْگەیـە لەسـەر نـەبوونی‌و نەداری.

*کێك: سەفەرە، بردنی بۆ کەسێك کەوا نەتوانێت بیخوات بەلْگەیە لەسەر غـەم‌و پەژارەو قورسی‌و گرانی بژێوی.
*نـــانی ناســـك و رەق: ســـەفەرە، دەگونجێـــت بەلْگـــەبێت لەســـەر ئاسـانبوونی کاروبـاری قـورس‌وگران، نـانی تـەڕیش بەهـەمان چەشـنە بـەلاّم نانی وشك شەڕە.
*کەنافە (جۆرە شـیرینییەکە) بەلْگەیـە لەسەر زانیاری‌و رێنومایی.
*نـانی پـیس‌و کـەڕوایی تێکـچوونی ئـاین‌و پاشـگەزبوونەوەیە لەئیـسلام، یاخود تێکچوونی حالْ‌و باری ژنانە.
*پارچە نـانی وردکراوە پارچـەی نـانی جیاواز جیاوازە بەلْگەیە لەسەر سـوودو قازانج لەخێر یاخود لەرووپاماییدا.
*نـانی پوخـت‌و پـاکیزە زانیارییـەکی بەسـوودو کەلْکـەو دلْسۆزییە لەگوتـەو کردارداو نهێنییەکی باشە.
*رووی دەرەوەی نـــان رووپامـــایی‌و دووڕوویییە.

**نـــانخواردن بەیەکـــەوە:** (نابلـــسی) دەلْێـت: نـانخواردن لەگـەلْ مـردوودا زەرەری هەیەو لەگەلْ کەسێکی نادیـار هەوالْێکـە لەلایەکـەوە پێـی دەگـات‌و لەگـەلْ جنۆکـەو شـەیتانەکان واژووی خراپەکارانـەو جووتبـوونیش بەهـەمان شێوەیە.

**نانـەوا:** (ئیبن سیرین) دەلْێت: نانـەوا خـاوەن گوتـەو سـەر قالْییـە لـەرزق‌و

ڕۆزیدا، هەموو پیشەیەك وابەستەی ئاگربێت قسەو ئاژاوەو دەنگدابڕینە.

*هەروەها دەڵێن: نانەوا دەستەلاتدارێکی دادپەروەرە، ئەگەر بینی لەخەودا بوە بەنانەوا نازو نیعمەتو فەڕو بەرەکەتو گەنجو سامان بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی ئاردی سپیدەکات بەنان ژینو بژێوییەکی خۆش بەدەستدەهێنێتو ڕێنوێنی خەڵکی دەکات بۆ دەوڵەمەندیو بارو حاڵێك سوودمەند دەبن لێی.

*ئەگەر بینی وەك ئەوەی لەنانەوایەك نان دەکڕێ بەبێئەوەی نرخو بەهاکەی بزانێ ژنێکی خۆشنوودو ڕزقو ڕۆزییەکی تەواوی پێدەگات.

*ئەگەر بینی نانەواکە پارەو بەهای نانەکەی لێوەرگرت گوفتارو وتەی پێویستە.

*ئەگەر بینی بوە بەنانەواو نان دروستدەکاتو بەخەڵکی گشتی بەچەند درهەمو دراوێك دەفرۆشێت خەڵکی تەباو کۆکدەکات لەسەر خراپەکاریو نابەجێ.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی نانفرۆش بەڵگەیە لەسەر کوڕو خۆشەویستی، ئەگەر نانەکەی وەرگرت لەنانفرۆش ژینو بژێویو سوود وەردەگرێو غەمو پەژارەی دەڕەوێتەوە.

*ئەگەر نانەوا درایەپاڵ دەستەلاتدار پیاوێکی بەسوودو قازانجدەبێتو خەڵکی پێویستیان پێیدەبێت.

*ئەگەر پیاوێکی بینی لەبنەڕەتدا نانەوانەبوو لەخەوەکەیدابوەوە بەنانەواو نانیدەفرۆشت بەدرهەم کاری دەویتی ئەنجامدەدات.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بینینی بەڵگەیە لەسەر زانا.

*بینینی بەڵگەیە لەسەر پەروەردەکارو زیندان یان خاوەن ژێر زەمین.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر هەڵهاتنو دوورکەوتنەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پیاوێکی فرەوەچەو نەوە.

*بۆ ڕەبەن بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیریو بۆ هاوسەرایەتیش بەڵگەیە لەسەر منداڵی نێرینە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خزمەتکاری دەستەلاتدار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر وازهێنان لەنوێژکردنو فەرامۆشکردنی گوێڕایەڵیو غەمو پەژارەو هەژاری.

**نانی تیری:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ڕزقێکی بەرینو فراوانە، ئەگەر بینی نانی تیریدەخوات ڕزقو ڕۆزی بەرینو فراواندەبێت، ئەگەر کولێرەی خوارد لەبژێویدا مامناوەندیدەبێت.

*ئەگەر دوونانی تیری بەدەستیەوە گرت هەر جارەی لەیەکێکیانیخوارد

پیاوێکە دووخوشك لەیەك كاتدا دەكات بەهاوسەری خۆی.

**نانی خڕ:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا سوودێکی کەمە.

**ناو:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر ناوی مرۆڤ لەخەودا گۆڕا بۆیەکێکی دی بەخۆشحاڵی گوزارشتی لێدەکرێت و پارێزراو دەبێت.

*ئەگەر گۆڕا بۆ یەکێك کەموکورتیەکی تێدابوو وەك کوێری و شەلی تووشی ئەو بەلاو نەهامەتیە دەبێت.

*ئەوەی ببینێ بەناوی خۆی بانگ ناکرێ ئەگەر ناوەکە ناقۆلابوو کەم و کوڕی و ناتەواوی یان نەخۆشی خراپ لێی دیاریدەدات.

*ئەگەر بەناوێکی باش بانگ کرا رێزو شکۆمەندی بەپێی ئەو ناوە پێدنبەخشرێ.

**ناوپەرداخ:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی ناوی پەرداخ لەخەودا بەلگەیە لەسەر جێگری پادشا ماڵ و دارایی بۆ دەبرێت، هەروەها ئەو جێگرە بەویستی خۆی هەڵس و کەوتی پێوە دەکات (اتون)یش لەهاتنەوە هاتووە، بەلام لەهەموو حاڵ و بارێکدا باشەو ئەوەی بینی ناوی پەرداخ دروستدەکات دەستەلات و فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێت، ئەگەر جوان و سەرنج راکێش نەبوو خەڵکی سەرقاڵدەکات بەکارێکی مەزن و گەورەوە.

**ناوچەوان( تەوێڵ ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ناوچەوان پلەوپایەو شکۆمەندی پیاوە ، کەم و کوڕی تێدا کەم و کوڕییە لەشکۆمەندییدا.

*ئەگەر ناوچەوانی ببێت بەئاسن و مس یان بەرد باشە بۆ خەڵکی گشتی.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر نێوچاوانی کەسانیتر بەبەرینی و فراوانی ببینێ رەوشتی تێکدەچێت دوای باشی، ئەگەر بەفەراوانتر بینی لەوەی دیبووی بێئەقڵ دەبێت دوای ژیری و ئەقڵداری، یان نەزاندەبێت دوای زانست و زانیاری.

*دەگونجێت نێوچاوان بەلگەبێت لەسەر رژدی و رێزداریی.

*ئەگەر نێوچاوانی بەرەشی ببینی دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر رژدی و بەخیلی و نەدانی مافی خودا.

*درەوشانەوەیی و رووناکی بەلگەیە لەسەر ماڵ وداراییی بەخشین و نەوازش.

*دەگونجێت ناوچەوان بەلگەبێت لەسەر ئەو بەرماڵ و راخەرەی مرۆڤ کڕنووشی لەسەر دەبات یان هەرشتێکیتر.

*هەروەها گەورەیی لەخەودا یان بوونی ئاسن و بەرد بەلگەیە لەسەر هەوڵدان لەنوێژدا یاخود هیچ و پووچی.

*ئەوەی نێوچەوانی بریندارى ببینێ یاخود زوخم و کێم بەدیبکات پێوەی نوێژ دەفەوتێنێ یاخود کڕنووشەکانی تەواو ناکات یان یەکێك بەقسەیەکی ناخۆش رووبەرووی دەبێتەوە.

**ناوك(كرۆك)**: (نابلسى)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەنکەخورماو پەتی بادراوو توێژی تەنك، ئەگەر ناوكێكی پێبوو دادگایی هەبوو بەڵگەكانی بەسەر نەیارەكانیدا سەردەكەوێ بەپێی ئایەتی: ﴿ولا يظلمون فتيلا﴾ (الإسراء: ٧١) ئایەتی: ﴿ والذين تدعون من دونه مايملكون من قطمير﴾ (فاطر: ١٣).

*هەروەها بەڵگەیەلەسەر تەمەنێكی درێژ.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر شتومەكو كاڵای ماڵ چونكە بناغەی ئاینە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر جیابوونەوەو دووریی.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ناوك ژنی پیاو یا خۆشەویستو دۆستو هەڵمەتبەرن.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر ناوكێكی بەنەخۆشیو شێوەی خراپەوە بینی بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی هەردووكیان، ئەگەر باوكیشی نەبوو بەڵگەیە لەسەر ئەو نیشتمانو زێدەی تێدا لەدایكبوە، بەڵام ئەوەی لەغەریبیدابێت بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوە.

*ئێشو ژانی ناوك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خاوەنەكەی بەخراپی مامەڵەدەكات لەگەڵ هاوسەرەكەیدا.

(نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر دایكی خەوبینەر یان باوكی یاخود بژێویو رزقو رۆزی یان ئەو پیشەیی بەڵێنكەرایی لەسەر دەبەستریٚ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:

+هاوسەرەكەی.

+دۆستو دڵداری.

+جزدانی پڕ لەپارەی داخراو.

*ئەگەر لەخەودا بینی رووداوو كارەساتیٚ رووی تێدەكاتو دەگەڕێتەوە بۆئەوەی باسمانكرد لەدایكو باوكو كوڕو ماڵو سامان، ئەگەر خەوبینەر نەخۆشبوو بەڵگەی مەرگیەتی بەتایبەت ئەگەر بینی ناوكی ئاوساوە، ئەگەر بەدەستی خۆیكردیەوە بەناوسكیدا گەنجینەكەی بەدەستیدەگاتو یان ئەو جزدانەی خێری لێدەكات.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرخۆشی.

*ئەگەر بینی دووناوكی هەیە دووكچی جوانیدەبێت.

*ئەگەر ئێشو ئازاری بەناوكیەوە دی دایكو باوك یاخود وڵاتو نیشتمانی باوباپیرانی لەدەستدەدات.

**ناوی خوابردن(یادی خواكردن)**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر مەردوم بینی لەخەودا (سبحان الله)دەكات غەمو پەژارەكانی دەڕەوێتەوە بەشێوەیەك وایدانەناوە، ئەگەر وایبینی ناوی خوابردنی لەبیرچوەتەوە غەمو پەژارە رووی تێدەكات بەهۆی ئایەتی: ﴿فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ﴾ (الصافات: ١٤٣).

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی یادی خوادەكاتەوە پیاوێكی باوەڕدارە،

ئەگەر یادی خواینەکرد بێباوەڕە، بەڵام ئەگەر (سبحان الله)ی کرد گەر غەمو پەژارەداربوو یان نەخۆشبوو یا ترسی لێنیشتبوو خوداوەند دەرووی لێدەکاتەوە لەلایەکەوە خۆی هەستی پێنەکردووە.

*ئەگەر لەخەودا نوێژێکی فەرزیکرد پاشان یادی خوایکردەوەو بەمەزنی دانا بەڵگەیەلەسەر قەرزدانەوەو گەردن پاکیو ئەمەکداریو بەجێگەیاندنی نەزرو پەیمانو ئەومەرجانەی لەسەرخۆی داناوە.

**ن ك**

**نکوولیکردن**: (نابلسی)دەڵێت: نکوولیکردن دووجۆرە نکوولیکردن لەحەقو ناحەق، ئەگەر نکوولی لەناحەق بکات فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپەدەکات، بەڵام ئەگەر نکوولی لەحەق بکات بێباوەڕ دەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿وَمَا يَجْحَدُ بآيَاتِنَا الاَّ الكَافِرُونَ﴾(العنكبوت: ٤٧).

**ن م**

**نمایشکراو**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکە هاوەڵانی بەسەردەکاتەوەو کاروبارەکانیان چاکدەکات.

*ئەگەر بینی ئەوەی نمایشدەکرێ لەلایەك لەکەسو کاری نییە دەمرێ، ئەگەر بینی تورەیە لێی گوناهو تاوانی ئەنجامداوە، ئەگەر رازیبوو لێی بەڵگەیە لەسەر رەزامەندی خوداوەند.

*ئەگەر بینیو ویستیان بیخەنە روو لەمەرگ نزیکدەبێتەوە پاشان قوتاردەبێ.

**نمرەساز**: (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر وێنەگرو نیگارکێش، ئەگەر لەخەودا بینی نمرەسازە دەبێت بەنووسەر یاخود لەقوماردا دەیباتەوە.

*بینینی ژنی نمرەساز بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بازیو یاریدەکات بەمەڵاشوو.

**ن و**

**نوح( سەلامی خوای لێبێت )**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر (نوح) پێغەمبەری بینی تەمەنی درێژدەبێو بەڵاونەهامەتی لەدوژمنەکانیەوە پێدەگات ، پاشان سەرکەوتن بەسەریانداو پتر سوپاسی خوداوەند دەکات بەپێی ئایەتی: ﴿ إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴾ (الإسراء:٣).

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر (نوح)ی بینی(سەلامی خوای لێبێت) پیاوێکی زانای گوێرایەڵو دەبێو نەرمونیاندەبێ، دوژمنی زۆری دەبێتو سەردەکەوێت بەسەریانداو پلەوپایەیەکی مەزنو گەورە بەدەستدەهێنێو هاورێکانی گوێرایەڵی ناکەنو پاشان زاڵدەبێت بەسەریاندا.

*هەروەها گوتراوە: بینینی (نوح) (سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەیە لەسەر زۆری باران لەوساڵەدا بەهۆی ئەوەی ئاو لەسەردەمی ئەودا زۆربوە.

*ئەگەر (نوح)ی بینی پیاوێکی دوژمنداره‌و دراوسێکانی ئیره‌یی پێده‌به‌ن‌و پاشان قوتارده‌بێت لێیان دواتر خوداوه‌ند تۆڵه‌یان لێده‌سێنێت.

*هه‌روه‌ها گوتراوه: بینینی (نوح) (سه‌لامی خوای لێبێت) به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر تیاچوونی بێباوه‌ڕان‌و دڵنیاییه بۆ باوه‌ڕداران. ئه‌گه‌ر له‌نه‌بوونیدا بینرا به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر زۆری باران، ئه‌گه‌ر له‌که‌شتیه‌کدا بینرا به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر قوتاربوون.

*هه‌روه‌ها بینینی به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر به‌هێزی بیدعه‌خوازیی‌و لاوازی باوه‌ڕداران.

*هه‌روه‌ها بینینی به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر گوێڕایه‌ڵی خوداوه‌ندو فه‌رمان به‌چاکه‌و ڕێگریی له‌خراپه.

*ئه‌گه‌ر خه‌وبینه‌ر پادشابوو سه‌رپێچیده‌کات‌و دوژمنایه‌تی بۆ به‌ده‌ر ده‌خات.

*بینینی به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر دوژمنایه‌تی خانه‌واده‌و سه‌رکه‌وتن به‌سه‌ریاندا.

*بینینی به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر نه‌بوونی‌و گرانی‌و به‌رزبوونه‌وه‌ی نرخ.

*ده‌گونجێت بینینی به‌ڵگه‌بێت له‌سه‌ر ڕه‌واندنه‌وه‌ی غه‌م‌و په‌ژاره‌و بارانبارین‌و بۆڵه‌بۆڵی منالان.

*ده‌گونجێت به‌ڵگه‌بێت له‌سه‌ر پیشه‌سازی‌و کشتوکاڵ‌و ڕێککردنی که‌شتی‌و سه‌فه‌ر له‌زه‌ویداو هه‌ڵگرتنی شتومه‌کی فره‌چێژو جۆر.

*بینینی به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر هه‌رکه‌سێك زانیاری هه‌بێت به‌ره‌چه‌ڵه‌کی مرۆڤ‌و جۆری ئاژه‌ڵ‌و باڵنده‌ی به‌هۆی ئه‌وه‌ی که‌شتیه‌که له‌و جۆرانه‌ی گرتبوه‌خۆ.

*ده‌گونجێت بینینی به‌ڵگه‌بێت له‌سه‌ر وه‌ڵامی پرسیارو پاشگه‌زبوونه‌وه له‌وه‌ی که‌له‌کیسیچووه له‌حه‌قدا.

*ده‌گونجێت یه‌کێك له‌منداڵه‌کانی له‌ئاینه‌که‌ی پاشگه‌ز ببێته‌وه یان له‌مه‌زهه‌ب‌و سوننه‌ت‌و له‌بری ئه‌وه تاقیی بکرێته‌وه‌و به‌سه‌رپێچیکاریی بمرێ، ده‌گونجێت ڕێگه‌ی شافه‌عه‌تکردنیشی نه‌درێ.

*ئه‌گه‌ر ژنێك (نوح)ی بینی به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر سه‌رپێچی هاوسه‌ره‌که‌ی‌و گوێڕایه‌ڵی بۆ خزمه‌کانی که‌که‌س‌وکارو هۆزوتیره‌ن.

**نوشته‌(جادوو)**: (نابلسی) ده‌ڵێت: ئه‌گه‌ر له‌نوشته‌دا گه‌ر بۆ نه‌خۆش نووسرابوو ئایه‌تی قورئان‌و سوننه‌تی تێدابوو به‌ڵگه‌یه‌له‌سه‌ر ئیمان‌و پارێزگاری‌و ڕه‌واندنه‌وه‌ی غه‌م‌و په‌ژاره، ئه‌گه‌ر واژووی ئه‌وه دوعبای خوێند به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر درۆو ساخته یاخود ڕووپامایی له‌کاروکرداردا، ئه‌گه‌ر خه‌وبینه‌ر پیشه‌کاربوو له‌پیشه‌که‌یدا ناپاکی‌و ساخته‌ده‌کات، ئه‌گه‌ر زانابوو ئامۆژگاریان لێده‌گرێته‌وه یا به‌هانه ده‌رده‌خات، ئه‌گه‌ر دادوه‌ربوو به‌ناحه‌ق بڕیارو حوکمده‌دات.

*ئەگەر بینی ئاو لەدەفرێکدا دەخوات یان ئاویدا بەیەکێك لەجامو پەرداخێکدا بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی.
*ئەگەر بینی دوعا دەکات یان دوعای بۆ دەکەن دوعا بەتاڵو درۆیە مەگەر دوعاکە (بسم الله الرحمن الرحیم) یا ئایەتەلکورسی یاخود ئایەتێکی قورئانی تێدابێت.
**نوقمبوون**: (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی لەئاوی دەریادا رۆچوە قوڕولیتاوییوو غەمو پەژارەی لەدەستەلاتدار دەستدەکەوێ، ئەگەر گەوهەری لێدەرهێنا لەفەرمانڕەواوە کچێکی دەستگیردەبێ یاخود زانیاری یان گەنجێك بەئەندازەی گەوهەر.
*ئەگەر بینی لەنێو روبارێکدا رۆچوەو ناتوانێ لێی دەربێ ئارامی زیانگیری نییە.
*ئەگەر بینی لەنێو دەریایەك رۆچوەو لەسەر گەوهەرێکە داواکاری زانیاری یان ماڵو داراییەو بەئەندازەی ئەو گەورە بەدەستیدەهێنێت.
**نوکتەباز( منولوجست )**: (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر فڕوفێڵو پلانێك خەڵکی پێ لەخشتەدەبرێ یاخود مرۆڤێك گاڵتەی پێدەکرێ.
**نوێژ**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: (ئەبو سەعد) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: بینینی نوێژ لەخەودا باشە لەدنیاو ئایندا بەڵگەیە لەسەر:
+بەدەستهێنانی دەستەلات.
+قەرزدانەوە.
+سپاردنی ئەمانەت.
+بەجێهێنانی فەرزێك لەفەرزەکانی خوداوەند.
*هەروەها نوێژ سێبەشە: فەرزو سوننەتو نوێژی خۆبەخش. نوێژی فەرز ئەوەیە کەباسمانکردو خاوەنەکەی خوداوەند (حەج)ی لەچارە دەنووسێو لەخراپە خۆی دوور دەخاتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿ إِنَّ الصَّلاَةَ تَنْهَى عَنِ الفَحْشَاءِ والمُنْكَرِ ﴾ (العنكبوت: ٤٥).
*سوننەت بەڵگەیە لەسەر پاکێتی خاوەنەکەیو ئارامگرتن لەسەر کاری خراپەو دەرخستنی ناوێکی باش بەپێی ئایەتی: ﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ (الأحزاب: ٢١) سۆزوبەزەیی بۆ دروستکارانی پەروەردگار، هەروەها خزمەتی بۆ منداڵو ژێردەستەکانیدەکاتو باشە ئەنجامدەدات لەگەڵیانو هەوڵدەدات لەکاروباری هاوەڵانیدا، ئەمەش شکۆمەندی پێدەبەخشێ.
*خۆبەخش(خۆبەخش، تطـوع): ئەوپەڕی پیاوەتیو رەواندنەوەی غەمو پەژارەیە.
*ئەگەر بینی نوێژی نیوەڕۆ ئەنجامدەدات لەرۆژێکی سامالدا لەکاروبارێکدا میانەڕەو دەبێ شکۆمەندی پێدەبەخشرێ بەپێی

ساماڵی لەو ڕۆژەدا، ئەگەر ڕۆژێکی تەمو مژاوییبوو دەستەبەری غەمو پەژارەدەبێت.

*ئەگەر بینی نوێژی عەسر دەکات بەڵگەیە لەسەر ئەو کارەی لەسەریبوە کەمێکی ماوە.

*ئەگەر بینی نوێژی نیوەڕۆ دەکات لەعەسردا قەرزەکەی دەداتەوە.

*ئەگەر یەکێك لەو دوونوێژە (نیوەڕۆ یان عەسر) بچڕا نیوەی قەرزەکەی دەداتەوە یان نیوەی مارەیی بەپێی ئایەتی: ﴿ فنصف ما فرضتم ﴾ (البقرة: ٢٣٧).

*ئەگەر بینی نوێژی ئێوارە دەکات ئەرکی خۆی بەرانبەر منداڵەکانی بەجێدەهێنێ.

*ئەگەر بینی نوێژی خەوتنان دەکات بەجۆرێك مامەڵە دەکات لەگەڵ منداڵەکانی کەدڵیان خۆشدەکاتو هێمنیو ئارامیان پێدەبەخشێ.

*ئەگەر بینی نوێژی بەیانیدەکات کارێك دەستپێدەکات دەگەڕێتەوە بۆ چاککردنی بژێوی خۆیو منداڵەکانی.

*ئەگەر بینی نوێژی نیوەڕ یا عەسر یاخود خەوتنان دووڕکاتی لێدەکات سەفەردەکات، ئەگەر ژنێك خەوێکی لەو جۆرە ببینێ ئەو ڕۆژە دەکەوێتە خولی مانگانەوە.

*ئەگەر بینی نوێژەکەیچوو یان شوێنێکی نەدۆزیەوە نوێژی لێبکات قورسیو گرانی کاروبارەکانیەتی، لەکیسچوونی دەستنوێژو تەیەمومو خۆشۆردنی پێویست ئەنجام نەدانیشی هەر بەوچەشنەیە.

*ئەگەر بینی بەدانیشتنەوە نوێژدەکات بەبێ هۆ کردارەکانی وەرناگیرێ.

*ئەگەر لەسەر لا نوێژیکرد نەخۆشدەکەوێ.

*ئەگەر بینی بەسوارییەوە نوێژدەکات ترسوبیم دێت بەسەریا.

*ئەگەر بینی ئیمامێك نوێژ بۆ خەڵکیدەکاتو سوارییەو بەسواری وڵاخ یان لەنێو ئوتومبیلدان ئەگەر لەجەنگدابوون سەرکەوتنیان پێدەبەخشرێ.

*ئەگەر بینی لەبێستانێکدا نوێژدەکات داوای لێخۆشبووندەکات لەپەروەردگار.

*ئەگەر بینی لەنێو کشتوکاڵدا نوێژ دەکات خوداوەند مافی خۆی لێوەردەگرێتەوە.

*ئەگەر بینی لەکوشتارگەیەکی گەرماوی ئاژەڵدا نوێژدەکات بەڵگەیە لەسەر گوناهو تاوانێك ئەنجامیدەدات یا کاری نێربازی لەگەڵ هەرزەیەکدەکات.

*ئەگەر بینی نوێژێکی فەرزی چوو هیچ شوێنو جێگەیەکی بەدینەکرد بیگرێتەبەر ناتوانێت داواوخوازی خۆی بەجێ بهێنێ.

*ئەگەر بینی لەنێو کۆمەڵێکی ڕیزرێکدا نوێژدەکات زۆریادی خودا دەکەن بەپێی ئایەتی: ﴿ وَاِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُونَ

(۱٦٥) وَاِنَّا لَنَحْنُ المُسَبِّحُونَ (۱٦٦) ﴾ (الصافات).
*ئەگەر بینی نوێژێکی فەرزینەکردو وازی لێهێنا سووکایەتیدەکات بەشەرعی خوا.
*ئەگەر بینی لەنوێژدا بەپێوە وەستاوەو نەچەمایەوە هەتا کاتەکەی بەسەرچوو زەکات نادات.
*ئەگەر بینی نوێژدەکاتو هەنگوین دەخوات دەچێتە لای ژنەکەی لەکاتێکدا بەرۆژوە.
*ئەگەر بینی نوێژدەکات روو بە(کابە) بەڵگەیە لەسەر جێگیربوونی ئاینی.
*ئەگەر روو بەرۆژئاوا نوێژیکرد بەڵگەیە لەسەر وشکی مەزهەبیو چاونەترسی لەسەر سەرپێچی، چونکە رووگەی جوولەکەیەو ئەوانبوون بێگوێپێدان بەفەرمانی پەروەردگار لەرۆژی (شەممە)دا راویانکرد.
*ئەگەر روو بەرۆژهەڵات نوێژیکرد بەڵگەیە لەسەر داهێنانو خۆسەرقاڵکردنی بەکاری بەتاڵ چونکە ئەوەش رووگەی مەسیحیەکانە.
*ئەگەر نوێژیکردو پشتیکردبوە رووگە لەنوێژدا بەڵگەیە لەسەر وازهێنانی لەئیسلامو ئەنجامدانی گوناهە گەورەکان.
*ئەگەر بینی رووگە(قیبلە) نادۆزێتەوە سەرسامە لەکاروبارەکانیدا.
*ئەگەر نوێژیکرد بۆلایەکیتر بەدەر لەرووگە بەلام جلوبەرگێکی سپی پۆشیبوو قورئانی دەخوێندەوە بەو چەشنەی پێویستەو ئەوە (حەج) دەکات بەپێی ئایەتی: ﴿ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللهِ ﴾ (البقرة: ۱۱٥).
*ئەگەر بینی سوپاسگوزاری دەنوێنێ بۆ پەروەردگار کوڕێکی پێدەدرێ بەپێی ئایەتی: ﴿ الْحَمْدُ للهِ الَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَرِ اسْمَاعِيلَ ﴾ (ابراهیم: ۳۹).
*ئەگەر بینی سوپاسوستایشی پەروەردگار دەکات هێزو نورو رێنومایی لەئایندا پێدەدرێ، ئەگەر خاوەنی ئەو خەونە بەرپرسبوو دەبێت بەفەرمانڕەوای شارێکی ئاوەدان بەپێی ئایەتی: ﴿ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴾ (سبأ: ۱٥).
*ئەگەر بینی نوێژی هەینی دەکات سەفەرێکی پڕ لەخێر ئەنجامدەداتو خێری دەستگیر دەبێت لەگەڵ رزقو رۆزیو چاکە.
*ئەگەر بینی لەرۆژی هەینیدا نوێژی هەینیدەکات کاروباری پەرتەوازەی بۆ کۆدەبێتەوەو دوای ناڕەحەتی سووکو ئاسانی رووی تێدەکات، هەروەها دەڵێن: ئەوەی خەوێکی لەو چەشنە ببینێ گومانێکی باش بەکارێکدەبات بەلام بەو شێوەیە نییە، ئەگەر خاوەنی ئەو خەونە ژنبوو کوڕێکیدەبێت.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی نوێژی فەرزی ئەنجامدا لەکاتی دیاریکراودا بەدەستنوێژو هەڵسانو چەمانەوەو

کڕنووشی روو بەقیبلە ئەنجامدا ئەو فەرزەی خوداوەند لەسەری داناوە بەجێی دەهێنێت وەك (حەج)و قەرزدانەوەو خۆی لەستەمکاری خراپە بەدوور دەگرێت.

*نوێژی فەرز لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی پەیمانو خزمەتی بێکارو ئاشتبوونەوە لەگەڵ ئەوەدا کەدەنگی لێدابڕیوە ، ئەگەر پیشەوای مزگەوتبوو دەستەبەردەکرێ یان قەرزی پێدەدرێ، ئەگەر نوێژخوێنبوو دەبێت بەئەرك بەسەر کەسانیترەوە.

*نوێژی نیوەڕۆ خۆپیشاندانە یان خۆدەرخستنە چونکە نهێنیو پەنهانە.

*ئەگەر بینی نوێژی نیوەڕۆ دەکات پێداویستی بەدەستدەهێنێتو سەردەکەوێت بەسەر هەموو پێداویستیەکانیداو قیامەتی باشدەبێ دوای ئەوەی نوێژەکەی بەجێدەهێنێت، چونکە تەواوکردنی نوێژ بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی خواستی مرۆڤ.

*نوێژی عەسر سوێندە دەیخوات یا بۆ کەسێکیتری دەخواتو بەڵگەیە لەسەر غەرامە.

*ئەگەر بینی نوێژی عەسر دەکات ئەو داوایەی دەیکات بۆی بەجێدێت دوای ناڕەحەتیو دەردەسەری، بەلأم ئەگەر نوێژەکەی تەواو نەکرد کردارەکەی لەسەر قورسدەبێ.

*ئەگەر بینی نوێژی ئێوارەدەکاتو رۆژئاوابوە داواکەی بەسەرچوەو گەیشتوەتە کۆتاییەکەی، ئەگەر نوێژەکەی تەواوکرد ئەوەی خوازیاریەتی بۆی بەجێدێت.

*دەگونجێت نوێژی خەوتنان بەڵگەبێت لەسەر تەواوبوونی کردارەکانی یاخود بەسەرچوونی تەمەنی هەتا دوایین کاری ئەوکات بەئاگادێت لەو خەونەی کەمەرگەو پەلکێشیدەکات.

*ئەگەر بینی نوێژی بەیانیدەکات بەیانی دادێت بەسەریاو بەرواڕێکی نزیك رووی تێدەکات گەر شەڕبێت یان خێر.

*ئەگەر بینی نوێژی خەوتنان ئەنجامدەدات ئەرکی سەرشانی بەجێدەهێنێت خوداوەند لەسەریداناوە لەپەیداکردنی بژێوی ماڵو منداڵو جلوبەرگو پێداویستیەکانی دیکە.

*ئەگەر بینی نوێژی بەیانیدەکاتو رۆژیش بوەتەوە لەخاڵێکەوە دەستپێدەکاتو هەوڵدەدات لەبۆ چاککردنی بژێوی خانەوادەکەی.

*نوێژی خەوتنان بەڵگەیە لەسەر تەواوبوونی لەکارەکانو پشوودانی ماندوو.

*نوێژی خەوتنان بەڵگەیە لەسەر شاردنەوەی کاروبارەکان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر جەنگاندن لەدژی شەیتانو دوژمنان لەکاتی خەوی نیوەڕۆدا.

*خەوی عەسر بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتن ئەگەر لەخەودا نوێژی

ئەنجامدا، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ڕێنومایی‌و خێرو پارێزگاریی.

*نوێــژی ئێــوارە بەڵگەیــە لەســەر جیابوونــەوە لــەدایك‌و بـاوك یــەكێكیان یاخود ئــەوەی دەستی بەسـەرا گرتـوە یان لابردنی ئەوەی خۆركەوتن بەڵگەیە لەسەری.

*ئەگــەر بینــی نوێــژی خــەوتنان ئەنجامــدەدات دەگونجێــت بەڵگــەبێت لەسەر:

+خۆ ئامادەكردن بۆ سەفەر.

+هاوســـــەرگیری گواســــــتنەوە لەشوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دی.

+خەوتنان خۆی‌و لاوازی بینایی‌و چاو.

+فراوانی چارەنووس‌و ئەجەل.

*ئەگــەر نوێــژی بــەیانی ئەنجامــدا سوێندێكەو خواردوویەتی.

*ئەوەی نوێژی عەسر بكات ئاسانی‌و خۆشــــی دوای ناڕەحــــەتی ڕووی تێدەكات.

*ئەگــەر نوێــژی ئێــوارەی ئەنجامــدا لەكارێكدایە تــەواوبوە لێی‌و بـەخێرایی پێیدەگات.

*ئەگــەر بینــی نوێــژی خــەوتنان ئەنجامــدەدان فرۆفێــڵ‌و دەســتبڕین ئەنجامدەدات.

*ئەگــەر بینــی نوێــژی هــەینی ئەنجامــــدەدات خــوازو داوای بــۆ بەجێدێت‌و دەكـات بـەهیواو ئـاواتی خۆی.

*ئەگەر بینی لەكێڵگەو بێستانێكدا نوێژ دەكـــات داوای لێخۆشـــبووندەكات لەپــەروەردگار ، ئەگــەر لەزەوییــەكی كــشتوكاڵیدا نوێــژیكرد قەرزەكــەی دەداتەوە.

*ئەگــەر لەكوشــتارگەیەكی گەرماویــدا نوێژیكرد كاری نێربازی لەگەڵ منـداڵێك ئەنجامدەدات.

*ئەگەر بینی بەدانیشتنانەوە بەبێ هـۆ نوێــژدەكات كردارەكــانی وەرنــاگیرێ، ئەگــــــەر لەســــــەر لا نوێــــژیكرد نەخۆشدەكەوێ.

*ئەگــــەر نوێــــژیكردو لەمزگــــەوت هاتـــــەدەرەوە خێـــــرو چـــــاكەی دەستدەكەوێ.

*ئەگــەر بینــی بــەپێوە نوێــژدەكات تــرس‌وبیم‌و كوشــتار ڕووی تێـدەكات، ئەگــــەر پێــــشەواو ئیمــــام بــــەپێوە نوێــژیانكردو ســەرجەم ســرووتەكانیان بەوچەشنەبوو خەڵكیشیان لەگەڵدابوو ئەگــــەر لەجــــەنگ‌و كوشــــتاردابن سەردەكەون.

*ئەگەر بینی نوێژە فەرزەكانی كردووە بەدووركات سەفەردەكات.

*ئەگــــەر بینــــی نوێــــژدەكات‌و هەنگوینـــــدەخوات دەچـــــێتە لای هاوســـەرەكەی لەكاتێكـــدا بـــەرۆژوە، ئەگەر ژنێك بینی نوێـژە فـەرزەكان دووركات دەكـات لـەورۆژەدا دەكـەوێتە خولی مانگانەوە.

* ئەگەر بینی نوێژەکەی چوو لەکاتێکدا ئەوەنـدە گـەڕا بـەدووی شـوێنێکدا کاروبـاری ئـاین یـا دنیـای لەسـەر قوس‌وگراندەبێ.

* ئەگەر لەخۆوە وازی لەنوێژهێنا یاخود نکوولی لێکرد یاخود ویستی بیگێڕێتەوە سـوکایەتی بەشـەریعەتی ئیسلامیدەکات‌و دەیەوێت گۆڕانی تێدا ئەنجامبدات.

* نوێـژی هـەینی لەخـەودا بەڵگەیـە لەسەر:

+خۆشی‌وشادی.

+چوون بۆ (حەج)و بۆنە ئاینیەکان.

+دانەوەی هەندێك قەرز.

* نوێـژی جـەژنی (رەمـەزان) لەخـەودا بەڵگەیە لەسەر:

+قەرزدانەوە.

+چاکبوونەوەی نەخۆش.

+قوتاربوون لەناڕەحەتی.

+رەواندنەوەی غەم‌و پەژارە.

* نوێـژی جـەژنی (قوربـان) بەڵگەیـە لەسەر:

+چاولێکاری لەکاروبارەکاندا.

+پاراستنی وەسیەتنامە.

+بەجێهێنانی نەزر.

* دەگونجێت ئـەو دوونوێـژە بەڵگـەبێت لەسەر:

+خۆشحاڵی و غەم‌و پەژارە.

+جێگیری.

* ئەگەر کەسێکی لەش‌ولارساغ نوێـژی وەك نەخۆ[illegible]ك ئەنجامـدا بەڵگەیـە لەسـەر کـەموکوڕی لەبەختـداو دووڵی لەوتەو کردارا.

* نوێژی هەینی وەك نوێـژی کـورتکراوە وایـە بەڵگەیـە لەسـەر سـەفەر، دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر فیتنـەو ئاشوبی دوژمن.

* نوێژ لەسەرزەوی بـێ راخـەر بەڵگەیـە لەسـەر چـوونە لای ژن لـەدواوە یـان لەکاتی خولی مانگانەدا بەتایبەت ئەگەر ئـەو زەوییـە پـیس‌و پۆخڵبـوو، دەگونجێـت ئەنجامـدانی بەڵگـەبێت لەسەر هەژاری‌و پێداویستی‌و ملکەچی‌و رسـوایی، ئەگـەر بەعـەورەتی دیـارەوە نوێـژیکرد بەڵگەیـە لەسـەر خراپـەکردن بـەزوبانی بـەرۆژوەوە یـان خێرکـردن بـەماڵی حـەرام یـاخود شـوێنی حـەزو ئارەزوو دەکـەوێت‌و وادەزانێـت لەسـەر حەقە.

* ئەگەر نوێـژی ترسـی بەئەنجامگەیاند بەڵگەیـە لەسـەر بەسـتنی پەیماننامـەی شەریکایەتی‌و جموجـووڵ‌و گـۆڕان یـان روحکێشانی نەخۆش.

* قـسەکردن دەربـارەی نوێـژ بەڵگەیـە لەسـەر پاشـگەزبوونەوە لـەوەی بەخشیویەتی یان بێدەنگبوە لەسـەری یـاخود بەخـەڵات داویـەتی بەیـەکێك، ئەگەر شادریەوە یـان ئاشـکرایکرد یـان لەشـوێنی دەنـگ نزمکـردن دەنگـی بەرزکردەوە ئەگەر دادوەربوو بەناحـەق فەرمانـدەردەکات‌و روو لەبیدعـەو

ڕووپامابیدەکات ، وەگەرنا ئەو حەق و ماڵ و دارییەی لایەتی دەیشارێتەوە.
*ئەگەر لەچەمانەوەو کڕنووشبردندا پێشکەوت بەڵگەیە لەسەر پێچەوانەبوونی باوک و دایک یاخود ئەوەی ئەرکی گوێڕایەڵی لەسەریەتی، یان دەگونجێت بەهەڵەکردن و نەبوونی زیرەکی و لەبەرکردن تاقیبکرێتەوە.
*نوێژی (تەراویح) لەخەودا بەڵگەیەلەسەر ماندوبوون و هیلاکی و قەرزدانەوەو ڕێنومایی.
*نوێژەبارانە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:
+ترس و بیم.
+ڕژدی و نەبوونی.
+گرانی و بەرزبوونەوەی نرخ.
+وەستانی بژێوی و ڕزق و ڕۆزی.
+غەم و پەژارە بەهۆی بازرگانی و موڵکدارییەوە.
*نوێژی ڕۆژگیران و مانگگیران بەڵگەیە لەسەر پشوودان بۆیەکێك ڕۆژ بەڵگەبێت لەسەری یان مانگ. دەگونجێت ئەنجامدانی ئەو نوێژە بەڵگەبێت لەسەر:
+تەوبەکردنی خراپەکارو باوەڕهێنانی بێباوەڕ.
+ترس و بیم لەفەرمانڕەوایان.
+دەرکەوتنی نیشانەو هێمایەکی گشتی.
*نوێژی ترس بەڵگەیە لەسەر:
+خۆشەویستی و تەبایی.
+ڕێککەوتن و تەبایی لەوتەو ئاسایشدا.

*نوێژی مردوو (جەنازە) بەڵگەیە لەسەر کەموکوڕی لەنوێژە فەرزەکاندا وەك هەڵەکردن لەکڕنووش و هەستان و دانیشتندا. ئەگەر بینی نوێژ لەسەرمردوو دەکات زۆر دوعاو داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکات، ئەگەر ئەو نوێژەی تەواوکرد دوعای گیرایە، ئەگەر خۆی لەکاتی نوێژەکەدا بەرنوێژیدەکرد بەدەستەڵاتدارو فەرمانڕوا دادەنرێت لەلایەن فەرمانڕەوایەکی بەدخووی خراپەوە، ئەگەر بینی دەڵێت: پەروەردگارا سڵاو بدە لەدیاری فڵان ئەوە پەروەردگار لەوکەسە خۆشبوە.
*ئەگەر بینی لەدوای ئیمامەوە نوێژ لەسەر مردوویەکدەکات ئامادەی کۆڕێکدەبێت تێدا دوعا بۆ مردوو دەکرێ.
*ئەگەر بینی نوێژ لەسەر تەرمێکدەکات تکا بۆ پیاوێکی خراپ و بەدئاییندەکات.
*ئەگەر بینی لەڕۆژی هەینیدایەو نوێژی هەینی ئەنجامدەدات بەڵگەیە لەسەر دەرووی خێر لەوادەیەکی نزیکدا یاخود یەکگرتنی دوودڵدارو بەجێهێنانی پێداویستی و خواز.
*ئەگەر بینی بەتەنیا هەرخۆی نوێژدەکات بەتەنیا بۆ خۆیدەبێت بەدەر لەکەسانیتر.
*ئەوەی شتێکی لێونبێت و خۆی لەجەژندا ببینێتەوە لەدەستدایەوە بەدەستیدەهێنێتەوە، ئەگەر جەژنی

(رەمەزان)بوو لەتەنگەژەو ناڕەحەتی دەردەچێت بۆ خۆشیو شادی، ئەگەر لەجەژنی (قوربان)بوو ئەگەر زیندانیبوو قوتارو ئازاد دەکرێ، ئەگەر قەرزاربوو قەرزەکەی دەداتەوەو غەمو پەژارەی دەڕەوێتەوەو حاڵوباری باشدەبێ.

*ئەگەر بینی نوێژی ڕۆژگیران ئەنجامدەدات بەڵگەیە لەسەرئەوەی ڕووداوێك دادەبەزێت بۆ فەرمانڕەوایان یاخود ئەوانەی خەڵکی شوێنیاندەکەوێت یا زانایەك دەمرێتو خەڵکی سەرجەم نوێژی لەسەر دەکەن.

*ئەگەر بینی نوێژە بارانەدەکات بەڵگەیە لەسەر ڕووداوێك لەو جێگەیەدا ڕوودەدات لەفەرمانڕەواو دەستەلاتدارێك کۆدەبنەوە یان ملکەچی بەردەستیدەبن هەتا ئەوەی لەسەری داناون لاییبات.

*ئەگەر نوێژەکەیان بەتەواوی ئەنجامداو گەڕانەوە بۆ شوێنو جێگەی خۆیان خوداوەند دەروویان لێدەکاتەوە.

*ئەگەر بینی نوێژی سوننەتدەکات بەڵگەیە لەسەر زیادەو چاکی ئاینو پابەندبوون بەسوننەتەوە، هەروەها ئەگەر پیاوێکی عەجەمی کەنوێژ نازانێتو خوێندنەوەی باش نییە بینی بوە بەپێشەوا دەمرێت.

*ئەگەر بینی نوێژی سوننەتدەکات پابەندە بەسوننەتی پێغەمبەرەوەو( ﷺ) پاكو بێگەردە لەپیسیو ڕەوشو کرداریشی جوانە.

*ئەگەر بینی نوێژی خۆبەخش(تطوع)دەکات کاروبارەکانی قیامەت ئەنجامدەداتو بەئەندازەی ئەو نوێژانەی دەیکات لەگەڵ نوێژی فەرزدا هەڵدەستێت لەبەجێهێنانی کاروباری خانەوادەکەی.

*ئەگەر بینی نوێژی بەکۆمەڵ ئەنجامدەداتو ریزەکەیان ڕێکە کۆمەڵێکن زۆر یادی خوا دەکەنەوە.

*نوێژی سوننەت لەخەودا هێواشیو لەسەرخۆیو نزیکبوونەوەیە لەدڵەکان بەخزمەت یان ماڵو سامان، ئەگەر خەوبینەر ڕەبەنبوو خۆی ئامادە دەکات بۆ هاوسەرگیری، ئەگەر هاوسەرداربوو پەروەردگار دوو کوڕی پێدەدات بەپێی ئایەتی: ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً ﴾ (الأنبياء:٧٢).

*ئەگەر لەخەودا نوێژی سوننەتو خۆبەخشیکرد، ئەگەر هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێتو گوفتاری خێر لەزاری دێتە دەرەوە، ئەگەر شەونوێژیکرد پلەوپایەیەکی بەرزو بالا بەدەستدەهێنێت.

*نوێژی داخوازی(صلاة الحاجة) لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئامادەبوون لەبۆنەکاندا وەك(حەج)و...بەجێهێنانی نەزرو لەسەرخۆبەپێوستدانان.

*نوێـژکردن بەدانیـشتنەوە بەڵگەیـە لەسەر:
+نەتوانینو شکستهێنان.
+رازیبـوون بـەو رزقو ڕۆزییـەی بـۆی فەراهەمهاتوە.
+ئاگـاداركردن بەنەخۆشـی بـاوكو مامۆستاو ئەوەی لەئەستۆیدایە چاكەی لەگەڵبكات.
*نوێژی لێخۆشبوون: لەخەودا بەڵگەیە لەسـەر لێخۆشـبوون لەگوناهـەكان، ئەگەر بەرنوێژیكرد بۆ خـەڵكی بەڵگەیە لەسـەر بارانبـارین، ئەگـەر هـەژاربوو دەوڵەمەنـددەبێت، ئەگـەر نـەزۆكبوو منـداڵی نێرینەیـدەبێت، دەگونجێـت لەكشتوكاڵ یا داروتەختەو موڵكدا رزقو ڕۆزی بدرێت.
*نوێژی تەسبیحات: لەخـەودا بەڵگەیە لەسەر یارمەتیو ڕێنوماییو خێرو رزقو ڕۆزی.
*نوێژی (پـرس، ئیستخارە): لەخـەودا بەڵگەیـە لەسـەر بەسـەربردنی ئـەو گومانەی كەلەكاتی بێداریدا هەیەتی.
*هـەروەها بەڵگەیـە لەسـەر چارەنووسباشـی بۆئـەوەی سـوورە لەسـەری، ئەگـەر ئـەوەی نوێـژی (ئیـستخارە)دەكـات لـەرێبازدارانبێت كەموكوڕییە لەرێبازەكەیدا.
*نوێژی نادیار (غائب): لەخـەودا داوای سوودو قازانجێكە كەسـەفەری پێبكرێ یان كەسێكیتر سـەفەری پێوە بكـات، دەگونجێـت بەڵگـەبێت لەسـەر كەواهیدانو چاولێكردنی.
*نوێـژكردن لەسـەر گـۆڕ: لەخـەودا بەڵگەیە لەسەر خـەڵاتكردنی بـەدیاریو شـتی نایـاب یاسـاغی لەسـەرە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسـەر چاكە بۆ بێنەواو هەژارانی شایستەو زیندانی.
*نوێـژی(سـڵاوكردنی مزگـەوت) (تحية المسجد): بەڵگەیـە لەسـەر خـەرجكردن بۆ خزمو كەسوكارو هەژاران.
*نوێـژی بێئاگـایی: لەخـەودا بەڵگەیـە لەسەر خێر بـەنهێنیو داوای خۆنوانـدن لەستەمكاران.
*ئەگـەر بینـی شـەونوێژدەكات یـاخود لەڕۆژدا نوێژی سـوننەتدەكات كردارێك ئەنجامـدەدات بەهۆیـەوە لەخوداوەنـد نزیكدەبێتـەوە، دەگونجێـت تـەبایی لەنێوان گەلو نەتەوەیەكدا ئەنجامدبات بـەهۆی پەرتـەوازەیی حـەزو ئارەزوویانەوە.
*ئەگەر بینی لەنوێژەكەیدا پێدەكەنێ لەنوێژدا زۆر گاڵتەدەكات.
*ئەگەر بینی نوێـژدەكاتو سەرخۆشـە گەواهی ناحەقدەدات.
*ئەگەر بینی نوێژ دەكـاتو لەشیگرانە ئاینی خراپە.
*ئەگەر بینی بەلای راست یـان چـەپدا نوێـژدەكات لەئیسلام لایداوەو واژووی شەریعەت هەڵسوكەوتدەكات.

*ئەگەر بینی نوێژخوێنانی مزگەوتێك روو بەقیبلە نوێژناکەن فەرمانڕەواکەیان لەکار لادەبرێ.

*ئەگەر بینی زانایەك روو بەقیبلە نوێژ ناکات یاخود کردارێکی پێچەوانەی سوننەتگەران ئەنجامدەدات دژی شەریعەتەو شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتوە.

*نوێژکردن روو بەجێگەیەکیتر بەڵگەیە لەسەر نزیکی لەخوداوەندو دڵی بەندەکانیەوە بەوەی ناگونجێت لەسەفەردا رووی تێبکات لەخەودا.

**نوێژکردن:** (نابلسی) دەڵێت: نوێژکردن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەجێهێنانی پەیمانو گەیشتن بەمەرام، هەروەها لەگەڵ دەروازەو دەروو لێکردنەوە.

*ئەوەی ببینێ لەبەر دەرگایەك یان لەسەر جێگەیەك نوێژ دەکات بەڵگەیە لەسەر مردنی.

*ئەوەی زیندانیەك بەدی بکات نوێژ دەکات یان بەپێوە نوێژ دەکات لەزیندان ئازاد دەبێت، ئەگەر کەسێکیتر بەدیبکات نوێژدەکات کاروباری فرۆش و ئاڵو وێڵ ئەنجامدەدات جێگەی ستایش و باسکردندەبێت.

*ئەوەی ببینێ بانگدەدات و قامەت دەکات سوننەتێك بەجێدەهێنێت و بیدعەیەك دەمرێنێت.

**نوور** (رووناکی ـ پرشنگ): (ئیبن سیرین) دەڵێت: رووناکی دوای تاریکایی بۆ یەکێك ببینێ ئەگەر لەفتنەدابوو یان لەدوودڵیدا رێنومایی دەکرێت و فیتنەکەیان لێدووردەکەوێتەوە، ئەگەر زوڵم و ستەمیان لەسەربێت دەرەوێتەوە، ئەگەر لەقات و قڕی و نەبوونیدابن دەروویان لێدەکرێتەوەو فەرپیت دەیانگرێتەوە ، بۆ بێباوەڕ بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی و بۆ رەبەن بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری و بۆ دووگیانیش لەدایکبوونی کوڕە.

*نوور رێنوماییە دوای وێڵی و سەرگەردانی و لێکدانەوەی بەپێچەوانەی تاریکاییەوەیە.

*(ئامینە)ی دایکی پێغەمبەر (ﷺ) لەخەودا بینی نورێك لەداوێنی هاتەدەرەوەو کۆشکەکانی (شام)ی رووناککردەوە ئەوجا پێغەمبەر(ﷺ) لەدایکبوو.

(نابلسی) دەڵێت: بەپێچەوانەوە ئەگەر مرۆڤ لە رووناکییەوە هاتەدەرەوە بەرەو تاریکایی بەڵگەیە لەسەر هەژاری دوای دەوڵەمەندی و ملکەچی دوای شکۆمەندی و وێڵی و سەرگەردانی دوای رێنومایی و کوێری پاش بینایی.

*نور بەڵگەیە لەسەر:

+کرداری چاکە.

+زانا.

+قورئان.

+کوڕی چاك.

*بۆ زانا بەڵگەیە لەسەر تاقیکردنەوە.
*ئەگەر بینی جل یان کراسێکی لەنوور پۆشی بەڵگەیە لەسەر زانیارییەکی بەسوود یان روو لەگوێڕایەڵی پەروەردگارەکەی دەکات.
*ئەگەر نورێکی بینی لەئامرازی نێرینەی هاتە دەرەوە یان لەهەندێك لەجەستەی کورێکی پێدەبەخشرێ کەسوودی لێوەردەگیرێ بەزانیاری یان کرداری جوانو سوود لەدوعاو نزای وەردەگرێ.
**نووستن**:(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بێئاگاییە ئەگەر بینی نوستوە یان دەیەوێت بنوێت بەڵگەیە لەسەر بێکاریو بۆ سەرجەم خەڵکی خراپە مەگەر بۆ کەسێك چاوەڕێی خراپە یان سزایەك بێت هەمووی دەڕەوێتەوە.
*ئەگەر بینی لەگۆڕستانێك نوستبوو یان لەسەری رێگەیەکدا یان لەسەر گۆڕ بۆنەخۆش بەڵگەیە لەسەر مردنو بۆ لەشساغیش بێکارییە.
*نوستن بەڵگەیە لەسەر پووچبوونەوەی سوودو قازانجو بێئاگایی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەر لەپێناوی گوێڕایەڵیو تێکۆشاندا لەگەڵ وازهێنان لەدنیاو شادییگێڕان بەجوانییەکانی.
*ئەگەر نوستوویەکی بینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تیاچوون لەوساڵەدا یان گرانی نرخەکان.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کاروباری داخراو، ئەگەر خەڵکی لەحاڵێکی ئاوادابنو بەنوستوویی بینی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوداوەند سزایان لەسەر لادەبات.
*ئەگەر بینی نوستوو لەسەر پشتی پاڵکەوتبوو لەدنیادا دەتوانێ پشکێ بەدەستبهێنێ.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی غەمو پەژارە.
*نووستن لەسەردەم باش نییە، بۆ فەرمانڕەوایان بەڵگەیە لەسەر لابردنیانو بۆ خەڵکیتر بەڵگەیە لەسەر کەمیو هەژاری.
*نووستن بۆ ژنی رەبەن شووکردنە.
*هەروەها گوتراوە: نووستن رەواندنەوەی گوناهو تاوانە چونکە قەڵەمی فریشتەکان ناینووسێ.
*هەروەها دەڵێن: نووستن ژێری دادەپۆشێو گوتراویشە نەخۆشییە.
*ئەگەر بینی نووستوەو دەترسێ دڵنیادەبێ، پێش نووستن بەڵگەیە لەسەر بێئاگایی لەبەرژەوەندی.
*نووستن لەسەر پشت پەرتەوازەییو ملکەچییو مردنە.دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کارو فرمان.
*دەگونجێت نووستن لەسەرلا خێر یا نەخۆشی یاخود مردنبێت.
*ئەگەر بینی لەپاڵدارێکی زۆردا پاڵکەوت وەچەو نەوەو کوڕی زۆردەبێ.

*نووستن لەسەر سك زەفەربردنە لەزەویداو بەدەستهێنانی ماڵوسامانو منداڵە.

**نووسەر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: خاوەنی فێڵو پیشەیەکی بەرێزە وەك کەوشدرووبی، پێنووس وەك دەرزیو سووژن وایە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کێلاندن.

*پێنووس وەك سك وایە ئەگەر رووداوێك روویکردە کەسێك لەگەڵ نووسەرێکی نادیاردا سیفەتەکە بزانەو پاشان بیدەپاڵ ئەوەی کەشایستەیەتی.

*ئەگەر نووسەرێك بینی نەخوێندەوارەو نووسین نازانێ هەژار دەکەوێت ئەگەر دەوڵەمەندبوو، یاخود شێتدەبێ ئەگەر ژیربوو یان بێباوەڕدەبێ ئەگەر تاوانباربوو یان ناتوانێ ئەگەر خاوەن پلانبوو.

*ئەگەر کەسێکی نەخوێندەوار بینی بەباشی فێری نووسینبوەو لەناڕەحەتیو قەیرانێکدا دەبێ خوداوەند رێنومایدەکات هۆکارێك بەکاربهێنێ هەتا لێی قوتار ببێ لەو قەیرانە.

*دڕانی کتێب رەواندنەوەی غەمو پەژارەیە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: نووسەر لەخەودا پیاوێکی قۆڵبڕە.

*ئەگەر بینی نووسەرێکی نەخوێندەوارە پلانێ دەگێڕێ یاخود ئاینی تیادەچێتو هەژاردەکەوێ.

*ئەگەر بینی نەخوێندەوار بوە بەنووسەر پلانو رێکخستنی پێدەبەخشرێ لەگەڵ فروفێڵ لەبەرانبەر ئەوەی پلاندەگێڕێ لەدژی.

*ئەگەر بینی خەتی ناخۆشە تەوبەدەکاتو واز لەپلاندەهێنێ.

*ئەگەر مرۆڤێك بینیبوە بەنووسەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گرنگیدەدات بەکاروباری کەسانیترو خۆی فەرامۆشدەکاتو بەهۆی ئەو رەوشەوە ماندوبوونێکی زۆر رووی تێدەکاتو هیچ سوودێك نابینێ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر مردن بۆ نەخۆشو بۆ خزمەتکار بەڵگەیە لەسەر چاکیو ئەمانەتپارێزی.

*بینینی نووسەرانی فەرمانڕەواو چوونە سەر سیفەتیانە لەخەوداو بەڵگەیە لەسەر بەرزبوونەوەی پلەوپایەو چاکی حاڵو بار.

*ئەگەر نووسەرانی فەرمانڕەوا بوون بەنووسەری سەر شەقامەکان بەڵگەیە لەسەر نزمیو دابەزینی حاڵو بایان ، هەروەها ئەگەر لەحاڵو بارێکی باشدا بەدیکردن بەڵگەیە لەسەر خێروچاکە.

*نووسەرانی داڕشتن بینیان بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندیو بەرزیو بەجێهێنانی پێداویستیو پەیوەندیکردن بەفەرمانڕەواو فەرمانبەرداریی دوڵەتو زانیار بەسوودو

تێگەیشتن و ڕەوانبێژی و ڕزق و ڕۆزی و سوود قازانج و هاوسەرو منداڵ و باوک و کەسوکار.

*نووسەرانی نهێنی بینیان بەڵگەیە لەسەر هەواڵ و زیادەو کەم و پەیمانبەستن و ئاگاداربوونی هەواڵی پەنهان و نهێنی.

*نووسەری سەرەڕێ و سەرشەقامەکان بینیان بەڵگەیە لەسەر پۆلیس و کەڵەشاخ.

*بینینی نووسەرانی بەڕێزو شکۆمەند مژدەو شادییە لەدنیاو قیامەتداو خەوبینەر دوایی شاددەبێت بەچوونە بەهەشت ئەگەر خواناسبێت ئەگەر وانەبوو باوریابێت خودا وەند دەفەرموێ: ﴿كِرَامًا كَاتِبِينَ ، يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾ (الإنفطار:١١-١٢).

**نووسین( تۆمارکردن ):** (نابلسی)دەڵێت: ئەوەدی نامە بۆ خزمەتکارەکەی بنووسێ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی هەردووکیان چونکە نووسین وابەستبوونی چارەنووسێکە بەچارەنووسێکیترەوە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر پشوویەک هەردوو هاوڕێ بەدەستیدەهێنن.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: نووسین بەدەستی چەپ خراپ و سەرگەردانییە. دەگونجێت کوڕو منداڵی زینا بخاتەوە یان ببێت بەشاعیر.

*نووسین لەبنەڕەتدا فروفێڵە و نووسەر دەستبڕە.

*ئەگەر بینی خەتی ناخۆشە تەوبەدەکات و دەستبەرداری فروفێڵ لەخەڵکیدەبێت.

*ئەگەر بینی نووسراوێك دەخوێنێتەوە میراتی بۆ دەمێنێتەوە، ئەگەر پشتی نووسراوەکەی خوێندەوە قەرز لەسەری کۆدەبێتەوە، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيباً﴾ (الإسراء: ١٤).

*ئەگەر بینی کتێبێك دەخوێنێتەوەو زیرەك و ژیربوو لەخوێندنەوەی کتێبەکەدا پلەوپایەو دەستەڵاتی دەستگیردەبێ ئەگەر شایستەبێ یاخود بازرگانیەکدەکات ئەگەر بازرگان بێت بەئەندازەی ژیری.

*ئەگەر بینی کتێبێکی خۆی دەخوێنێتەوە تەوبەدەکات بۆ لای خودا لەگوناهەکانی بەپێی ئایەتی: ﴿وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً﴾ (الأعراف:١٥٦).

*ئەگەر بینی چەکێك (پسووڵەیەك) لەسەری نوسراوە فەرمانی پێدەکرێ کەڵەشاخبگرێ چونکە هەرکەسێك شتێکی لەسەر بنووسرێ و نەزانێ چی تێدایە خوداوەند فەرزێکی لەسەر داناوەو ئەویش کەمتەرخەمی تیا دەکات بەپێی ئایەتی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا﴾ (المائدة: ٤٥).

*ئەگەر بینی نووسینێکی لەسەر نووسرا ئەگەر نووسەرەکەی ناسی ناپاکی لێدەکات و تووشی فیتنەو سەرگەردانیدەکات لەئاینەکەیدا بەپێی ئایەتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُ مَنْ تَوَلَّاهُ﴾ (الحج: ٤).

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا فرۆفێڵە، نووسەر دەستبڕە، ئەگەر بینی لەکاغەدا نووسی نکوولیکردنە لەوەی لەنێوان خۆی و خەڵکیدایە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی کتێبێك دەنووسیێ ماڵ و سامانێکی حەرام بەدەستدەهێنێ بەپێی ئایەتی: ﴿فَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ فَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا يَكْسِبُونَ﴾ (البقرة:٧٩).

*ئەگەر ئایەتێکی قورئانی بینی لەسەرکراسەکەی نووسرابوو پیاوێکە وابەستەی قورئانبوە.

*ئەگەر بینی نازانێ بنووسێ خراپەو بەلایەو خوداوەند رێنومایی دەکات بۆ هۆکارێك بەهۆیەوە قوتاربێ لەو نارەحەتییە.

*ئەگەر بینی کتێبێك دەنووسێ نەخۆشدەکەوێ بەلام ماڵ و سامانی هیچکەمناکات.

*ئەگەر بینی فێری نووسیندەبێ بەلام باش نییە بەڵگەیە لەسەر بارێکی باش کەتووشیدەبێت لەترس و بیم و ماندوبوون کەدەکەوێتە نێوی، ئەگەر بەباشی توانای نووسینی هەبوو بەلام وابینی ناتوانێ خراپەو بەڵگەیە لەسەر پووچەڵبوون و ترس و بیم و هیلاکی.

*ئەگەر بینی کتێبێکی نووسی یان تەواویکرد کاروبارەکانی بەجێدێت، ئەگەر تەواوینەکرد کاروبارەکانی بۆ بەجێنایەت.

**نووسین لەسەر بەڵگەنامە:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا لەسەر بەڵگەنامەیەکی نووسی فەرمانی پێدەکرێ خۆی بشارێتەوە.

**نووسینگە:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر سووکایەتی و رژدی و بژێوی تەنگ و گران و ترس و بیم.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پلەوپایی بەرزو شکۆمەند.

## نۆ

**نۆبەرەی خورما:** بەڵگەیە لەسەربوونی ئاو بۆئەوەی پێویستی پێیەتی، دەگونجێت خورمای سووریش بەڵگەبێت لەسەر زاڵبوونی خوێن و هی زەردیش زاڵبوونی زەردیی.

**نۆك:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ماڵ و داراییەك بەماندوییەتی بەدەستبکەوێت، ئەوەی نۆك بەگەرمی بخوات ماچی ژنەکەی دەکات لەمانگی رەمەزاندا.

**نۆکەند( جۆبار ـ جۆگەلە ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر خزمەتکاری ماڵ بەهۆی ئەو چڵك و پیسییەی سەرجەم ئەندامەکانی ماڵ ئەو پاکیدەکاتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر عەورەتی(حەرام) کەسوزانییەکان دەیخنەروو بۆ هەرکەسێك بیەوێتو میزی تێدەکریٚ چونکە پێغەمبەر (ﷺ) داوێنپیسی بەپیسی دەربڕیوە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قوتاربوون لەغەمو پەژارە.
*ئەگەر جۆگەو ئاوەڕۆیماڵەکەی گیرا خزمەتکارەکەی دووگیاندەبیٚ یان ژنەکەی داوێنپیسیدەکات یاخود ریگەی نادات بچێتە لای.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر زۆر بۆهاتنی بەهۆی میزگیرانەوە.
*ئاوەڕۆی نادیار میزکردن تێدا یان خوێن بەربوون تێیدا چوونە لای ژنێکە بەحەرامی یان ئەوەی شیاونییە لەگەڵی، وەگەرنا دەکەوێتە نێو غەمو پەژارەوە بەهۆی خزمەتکارو ژنو زیادەی ئەوەش لەبێداریدا دیاریدەدات.
(نابلسی) دەڵێت: نۆکەند لەخەودا ژن یا ماڵو دارایی یاخود زانایە، ئەگەر بینی جۆگەلەیەکی راکێشتا ئەوە هاوسەردەگریٚو ماڵو سامانو بژێوی دەستگیردەبیٚ یاخود کارێکی تایبەت لەئاینەکەیو دنیایداو بۆ سەرجەم خەڵکیدەبێت.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەر جۆگەلەیەکی بینی تووشی زیاندەبیٚ لەلایەن هەندێك لەخانەوادەکانیەوە.
*چەن جۆگەیەك خزمەتکارو ئاژەڵی سازشکراوە بۆ بەژرەوەندی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+ئابخانە.
+سەرچاوەی بژێویو رزقو رۆزی وەك بازاڕو فرۆشگاو دوکان.
*ئەگەر بینی جۆگەلەیەکی هەڵکەندوە بۆ ئاودانی کشتوکاڵ بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندیو فراوانیو بژێویو رزقو رۆزی کێشانی منداڵان، ئەگەر جۆگە ئاوەکەی بڕی لەکشتوکاڵ چاکەی لەخانەوادەکەی دەگرێتەوە، ئەگەر هاوسەرداربوو ژنەکەی تەڵاقدەدات یاخود خزمەتکارەکەی دەردەکات.
*دەگونجێت ئەوەی رامیکردوە بۆ خزمەتی موسوڵمانان بەتاڵیبکاتەوە یان خزمەتکارانی دووردەخاتەوە لەخزمەتکردنی.
*ئەگەر جۆگەلەیەکی لەماڵی خۆیدا بەدیکرد یان لەبێستانو کێڵگەیەکدا کچێکی بینی ئەگەر غەمباربوو خوداوەند دەرووی لێدەکاتەوە یاخود خێری دەستگیردەبیٚ.
*ئەگەر جۆگەلەیەکی هەڵکەندو ئاوی پێدا نەڕۆیی روو لەپلانو فروفێڵدەکات، هەموو چاڵێك کەئاوی تێدا نەبیٚ فروفێڵە.

## نەخش ونیگار

**نەخش ونیگار:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: نەخش ونیگار لەبنەڕەتدا خۆشیو شادیو ڕێزە، ئەگەر جلەکانی پیسبوو بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی. هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێی پیسکردوە

دەکەوێت بەسەریاو نکوولی لێدەگرێ لەنێو خەڵکیدا.

*دەگونجێت جلەکانی لەکاتی بێداریدا پیسبکات هەروەك لەخەودا بینیویەتی.

**نەخش ونیگاری جل وبەرگ:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ماڵ ودارایی و سوودو شکۆمەندی هێز بەئەندازەی جوانی.

*ئەگەر بینی جل وبەرگێکی نەخش ونیگاراوی لەبەردایە ژنێکی جواندەهێنێت بەئەندازەی جوانی نەخش و نیگاری جل وبەرگەکە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر رژدی و دڵفراوانی.

**نەخۆشی( بیماری ـ ناساغی ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەلاو نەخۆشی بەڵگەیە لەسەر بەلاو نەهامەتی کەم و کورتی لەپلەوپایەدا، بەڵام لووت برین و چاو دەرهێنان بەڵگەن لەسەر لووت بڕاو چاو دەرهێنراو قەزاری پاداشتی نەتەوەیەکە لەسەر کارێکی پێشوو بەپێی ئایەتی: ﴿والأُذن بالأُذن﴾ (المائدة :٤٥).

*ئەگەر بینی پیرێکی نەناسراو هەردوو گوێچکەی بڕی دوو قەرز دێتە ئەستۆی.

*ئەوەی ببینێ لووتی هاوڕێیەکی لەبنا بڕی ناپاکی لەگەڵ دەکات لەخانەوادەو منداڵەکانیداو بەڵگەیە لەسەر فەوتانی دەستەلات و توانای .

*ئەوەی ببینێ هەردوو گوێچکەی لەبن دەرهێنراون و ژنەکەی دووگیانبێت دەمرێت، ئەگەر ژنی نەبێت ژنێکی نێو خانەوادەکەیان دەمرێت.

(ئیبن سیرین)دەڵێت: هەموو نەخۆشییەك لەئایندا بەپێی ئایەتی : ﴿في قلوبهم مرض﴾(الاحزاب:١٢).

*ئەگەر یەکێك خەوێکی وابینی لەجەنگدابوو بریندارده‌کرێ بەپێی ئایەتی:﴿أَوْ كُنْتُم مَرْضَى أَنْ تَضَعُوا أَسْلِحَتَكُم﴾(النساء:١٠٢).مەبەستی برینداریيە.

*ئەگەربینی نەخۆشەو خەریکە روحی دەکێشن پاشان مردو ژنەکەی شوویکردەوە لەسەر بێباوەڕی دەمرێ.

*ئەگەر ژنەکەی بەنەخۆشی بینی ئاینەکەی باشدەبێ و بۆنەخۆشیش باش نییە خۆی بەچەورکراوی یان سواری حوشترو گوێدرێژو بەرازو گامێشەوە ببینێ، هەروەها بۆنەخۆش باشە خۆی بەقەڵەوی و درێژی و پانی بینی یاخود مەڕو مانگا لەدوورەوە ببینێ یان خۆی بەئاو دەشوات کەسەرجەم ئەوانە بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوەی نەخۆش.

*هەروەها ئەگەربینی ئاوێکی سازگار دەخواتەوە یاخود تاجەگوڵینەی پۆشیوە یان چوەتەسەر دارێکی بەردار یان سەری پەتیگرتوە، ئەگەر ناتەواوی و نەخۆشیەکی لەخۆیدا بینی کەم و کورییە لەئاینەکەیدا.

*هەروەها دەڵێن: بینینی نەخۆش بەڵگەیە لەسەر دەرووی خێرو سەرکەوتن و بەدەستهێنانی

ماڵوســـامان، بۆیـــەکێك لەبـــەڵاو نەهامەتیدابێ، بۆ دەوڵەمەنـدەکانیش بەڵگەیەلەســەر پێداویـستی چـونکە نەخۆش ئاتاجە.

*ئەگـەر کەسێك خوازیاری سـەفەربوو بینی نەخۆشە ڕێگرو کۆسپێك لەسەفەر دوایدەخات چونکە نـەخۆش ناتوانێـت سەفەر بکات.

*ئەگــەر کــەمو کــوڕی لەهەنــدێك لەئەندامەکانیـدا بینـی کـەمو کوڕییـە لەماڵو سامانو نیعمەتدا.

(نابلـسی)دەڵێـت: لەخـەودا دووڕوییـە بــەپێی ئایـــەتی: ﴿فِي قُلُــوبِهِم مَرَضٌ﴾(البقرة:١٠).

*ئەگەر بینی نەخۆشە ئاینەکەی کـەمو کوڕی تێدەکەوتنو لەشساغدەبێت لـەو ساڵەدا.

*ئەگـەر جـەنگاوەرێك بینـی نەخۆشـە بریندار دەبێ، ئەگەربینی هاوسەرەکەی نەخۆشـە غـەمو پەژارەیـە لەلایـەن دەســتەڵاتدارەوە. نەخۆشــی وشــك خـــەرجکردنی ماڵوســـامانە بـــەدەر لەگوێرایەڵی، نەخۆشـی جیـاواز سـزاو سووکایەتییە بەفەرزەکان.

*ئەگـــەر منـــداڵێك لەنەخۆشـــیەکەی چاکبوەوە دەمرێ.

*ئەگــەر ســەرجەم خـــەڵکی بینـــی نەخۆشـــنو کـــەس نییـــە لـــەبۆ پێداویـستیەکانیان بجـووڵێ شـــار گەمارۆدەدرێ.

*ئەگەربینی نەخۆشە دوژمنەکانیـەتیو خـــۆی بەخۆشـــنوودی دەژیو ماڵوسامانێکی مەزن بەدەسـتدەهێنێو تەمەندرێژو شادو دڵگەشدەبێت.

*ئەگەر کەسێك لەناڕەحەتیدابوو خـۆی بەنەخۆشــی بینــی قوتــاردەبێو بــۆ ســەرجەم خــەڵکی بەڵگەیــە لەســەر بێکاری.

*ئەگــەر کەســێکی ناسـیاوی بینــی نەخۆشـە ئەوکەسـە نەخۆشـدەکەوێ ، ئەگــەر کەســێکی نەناســراوی بینــی نەخۆشـە نەخۆشـی دەگەڕێتـەوە بـۆ خەوبینەر.

*نەخۆشی خەرجکردنی ماڵو سامانە، هــەروەها تەوبەیـەو دوعـاو پاڕانـەوەو عیشقە، هەروەها عیشقیش نەخۆشییە.

*ئەگــەربینی نەخۆشــە لەشــساغی پێدەبەخشرێ.

*ئەگــەربینی هــــەردوو کوڕەکـــەی نەخۆشــکەوتوون تووشـــی چاوئێــشە دەبێت.

(ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەربینی چـەند نەخۆشـیەکی گرتـوەو نەخۆشـیەکان ســاردە ســـووکایەتی بەفـــەرزەکان دەکـاتو سـزاو خـەشمی خـوایی بـۆ دێتــەخوارەوە، نەخۆشــی گــەرمیش لەلێکدانـــــەوەدا لـــــەلای دەستەڵاتدارەوەیە.

*ئەگەر خۆی بەنەخۆشی بینیو لەگەڵ کەسێکیتردا بەربەرەکانیو کێـشەی هەبوو نەیارەکەی دەیکوژێت.

*ئەگەربینی باوکی نەخۆشکەوتوە تووشی سەرئێشەدەبێت چونکە سەر بەباوك لێکدەدرێتەوە.
*ئەگەربینی نەخۆشکەوتوە قسەی پڕوپووچ و بەتاڵ و خراپەی زۆرە.
*ئەگەربینی نەخۆشەو نەخۆشیەکەی درێژەی خایاندوەو گوناهەکانی هەڵوەریوون دەمرێ و دەگات بەخوداوەند لەسەر باشترین حاڵ و شێوە.
*هەروەها دەڵێن: ئەگەربینی نەخۆشە ئومێدەواری شتێکە لەوساڵەدا.
*ئەگەربینی دەستەلاتدار نەخۆشە ئاینەکەی کەموکوڕی تێدا پەیدادەبێ و، وەگەرنا لەوساڵەدا دەمرێ.
*نەخۆشکەوتنی فەرمانڕەوای بالا بەلگەیەلەسەر لاوازی هیمەت یان زەفەربردن بەدوژمنان.
*نەخۆشی ژن دوورکەوتنەوەو تەلاقیەتی لەمێردەکەی هەروەك چۆن نەخۆشی پیاو جیاکردنەوەیەتی لەمێردەکەی.
*نەخۆشی زانایان لاوازی ئاینە.
*نەخۆشی ئەوەی خوازیاری مەرگیەتی دەرووی خێرە.
*نەخۆشی ئاژەڵ بەلگەیە لەسەر قاتوقڕی و سستی بژێوی و ژیان، دەگونجێت بۆ پزیشك و چارەسەرساز و کفندووران بەلگەبێت لەسەر سوودو قازانج.

*ئەگەر لەخەودا سکالاو باسی نەخۆشیەکی لەکەسێکەوە بیست بەلگەیە لەسەر غەم کەوا رووی تێدەکات لەسکالاکارەوە مەگەر سکالاکار دوژمنبێت لەکاتی بێداریدا پشوو خۆشی و شادی دەباتە نێو دلی شکاتلێکراو.

**نەداری و هەژاری:** (نابلسی) دەلێت: لەخەودا بەلگەیە لەسەر هەژاری و بێباوەڕی.

**نەرمونیانی ورگ:** (ئیبن سیرین)دلێت: سەروخواری بەلگەیە لەسەر هێزی لاشە یان پادشاو فەرمانڕەوا.
*ئەگەر ئێش وئازاری تێدا پەیدابوو نەخۆشکەوتنی خەوبینەرو هەژارییەتی.

**نەزانین:** (نابلسی)دەلێت: بەلگەیە لەسەر نەزانین و گێلی. ئەگەربینی نەزانبوە بەوەی وتەو قسەی هەلەتو پەلەت دەکات یاخود وتەیەکی خراپ لەزاری دێتەدەرەوە یان شەڕو خراپەی لێدەردەکەوێت یا ناهومێددەبێت لەسۆزو بەزەیی خوایی بەلگەیە لەسەر جنێو یاخود نوێژکردن بەبێدەستنوێژ.
*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر قسەکردن دەربارەی ئابڕووی خەلکی و خراپەو گوتەی ناڕەوا.
(ئیبن سیرین)دەلێت: ئەگەر یەکێك بینی نەزانە گێلە بەپێی ئایەتی: ﴿فَإِنْ كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا﴾ (البقرة: ٢٨٢).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی نەزان‌و گێلبوە دەربارەی خەڵکی ئاینەکەی تێکدەچێ، هەروەها ئەگەر بینی ئاینەکەی تێکچوە نەزان‌و گێلدەبێ بەرانبەر بەخەڵکی.
*گێلی‌و نەزانین لەخەودا بەڵگەی سەرکەوتنە بەسەر دوژمندا لەگەڵ بەرزی پلەوپایەو ئەگەر نەزانن بەرانبەر کەسێکی زیمی یان بیدعەکاربێت.

**نەعل:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەو نەعلەی مەردوم خۆی لێدەپارێزێت ئەگەر پێوەی رۆیی رێگەو سەفەرە، ئەگەر پچڕا لەسەفەرەکەی دەوەستێ، ئەگەر زمانەی سەرەوەی پچڕا کارێکی بۆ دێتە پێشەوە لەسەفەرەکەی دەوەستێ‌و رەنگی نەعلەکەشی کاریگەری هەیە.
*ئەگەر نەعلەکە رەشبوو داواکاری ماڵ‌و سامان‌و شکۆمەندییە، ئەگەر سوربوو داواکاری شادییە، ئەگەر سەوزبوو بۆ قەرزە، ئەگەر زەردبوو نەخۆشی‌و غەم‌و پەژارەیە.
*ئەگەر بینی بوە بەخاوەنی نەعلێك بەڵام پێوەی نەڕۆیی دەبێت بەخاوەنی ژن، ئەگەر لەپێیکرد جووتدەبێت لەگەڵ ژنەکەدا.
*ئەگەر بەدوو نەعلەوە دەچوو بەڕێوە یەکێکیان لەقاچی داکەند لەبرایان شەریکەکەی جیادەبێتەوە.
*لەپێکردنی دوو نەعل‌و رۆیشتن پێوەی سەفەرە لەچاکەدا، ئەگەر لەپێیکرد بەڵام پێوەی نەڕۆیشت ژنێکەو دەیکات بەهاوسەری خۆی، ئەگەر پێوەی رۆیشت لەشوێنی خۆی دەچێتە لای ژنەکەی. نەعلی خوریپۆش ماڵەو ئەو نەعلەشی لەشێوەی پێڵاودا دروستکراوە ژنە.
*ئەگەر بینی نەعلێکی لەپێکرد نەرم‌و خوری دارو نوێیوو لەپێنەکرابوو کچێکدەهێنێ.
ئەگەر بەشی دواوەی پچڕا ژنێك دەهێنێ بەبێشایەت، ئەگەر پێشەواو ئیمامی نەبوو ژنێکدەهێنێ بەبێ بەرپرس.
*ئەگەر نەعلەکەی جووتبوبوو پینەکەی شەقیبرد بەڵام نەکەوت ژنەکەی کچیدەبێت، ئەگەر هەردوو بەش ژێرو سەری بەیەکەوە نووسا ژیانی ئەو کچە لەگەڵ دایکی درێژ دەبێت، ئەگەر کەوت‌و بەربوو دەمرێت.
*ئەگەر نەعلەکەی دوورییەوە ناتەواوی ژنەکەی وازلێدەهێنێ‌و بەباشی مامەڵەی لەگەڵدەکات، ئەگەر کەسێکیتر پینەیکرد بەڵگەیە لەسەر خراپی ژنەکەی، ئەگەر نەعلەکەی برد بۆ پینەچییەك هەتا بۆی چاکبکات خۆی هانی ژنەکەیدەدات لەسەر ئەنجامدانی کاری خراپ.
*ئەگەر بینی بەتاکێ نەعلەوە دەڕوات بەڕێوە ژنەکەی تەڵاقدەدات یان لەشەریکەکەی جیادەبێتەوە، هەروەها گوتراوە: ئەو خەونە بەڵگەیە لەسەر

چوونە لای ژنێکی بەدەر لەویتر، یاخود سەفەرێکی ناتەواو ئەنجامدەدات.
*ئەگەر بینی نەعلەکانی ونبوو یان کەوتە نێو ئاوەوە ژنەکەی لەمەرگ نزیکدەبێتەوە پاشان قوتاردەبێت.
*ئەگەر بینی پیاوێك نەعلەکانی دزیو لەپێیکرد پیاوێك ژنەکەی فریو دەدات بەزانیاریو ئاگاداریی خۆی.
*نەعلی زیو زەوییەکی بەردەستە، ئەگەر لەقورقوشمبوو ژنێکی لاوازە، ئەگەر لەئاگربوو ژنێکی زاڵە، ئەگەر لەداربوو ژنێکی دووڕووی ناپاکە.
*نەعلی رەش ژنێکی دەوڵەمەندو شکۆدارە.
*نەعلی رەنگاو رەنگ ژنێکەکارو بارەکانی تێکەڵە.
*ئەگەر نەعلەکە لەچەرمی مانگابوو لە(عەجەم)ەبەلاّم ئەگەر لەپێستی ئەسپبوو لە(عەرەب)ە، ئەگەر لەچەرمو پێستی ئاژەڵی دڕندەبوو لە فەرمانڕەوا ستەمکارەکانە.
*نەعلی کەتانی ژنێکی داپۆشراوی قورئانخوێنی زوبان رەوانە.
*هەروەها گوتراوە: داکەندنی هەردووتاکی نەعل دڵنیاییو بەدەستهێنانی دەستەلاتە بەپێی ئایەتی: ﴿ فاخلع نعليك ﴾ (طه:١٢).
*پیاوێك لەخەودا بینی نەعلەکانی ونبوونو دوای گەڕانو پشکنینی زۆر ئەوجا دۆزییەوە، ئەم خەوەی بۆ (ئیبن سیرین)گێڕایەوە ئەویش وتی: ماڵو سامان وندەکەیتو دوای ماندوبوونێکی زۆر ئەوجا دەیدۆزیتەوە.
*هەروەها دەڵێن: رۆیشتن بەنەعلەوە سەفەرە لەگوێڕایەڵی خودایا.
*هەروەها لە(ئیبن سیرین)یان پرسی سەبارەت بەپیاوێك دوونەعلی لەقاچی خۆیدابببینێت، ئەویش وتی: سەفەر دەکات بۆ ولاّتانی عەرەبی، هەروەها گوتی: نەعل بەڵگەیە لەسەر برا.
*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا بینیم بەنەعلەوە دەچووم بەڕێوە، تاڵی یەکێك لەتاکە نەعلەکانم پچڕاو وازم لێهێناو بەردەوامبووم لەسەر رۆیشتن.
(ئیبن سیرین)پرسی: برات هەیە لەسەفەردابێت؟ وتی: بەڵێ، وتی: بەیەکەوە چوون بەرەو شوێنو جێگەیەكو لەوێ بەجێتهێشتوەو خۆت گەڕاویتەوە، وتی: بەڵێ، ئنجا (ئیبن سیرین)وتی: وادەبینم براکەت ژینی دنیای بەجێهێشتبێتو مردبێت، پاش ماوەیەکی کەم هەواڵی مەرگی گەیشت.
(ئیبن سیرین)دەڵێت: لەخەودا هاوسەرو کوڕو ئاژەڵو هاوڕێو شەریك سەفەرە.
*ئەگەر بینی نەعلێکی کڕی بەلاّم پێوەی نەڕۆیی کچێکدەهێنێ یان هاوسەرێکی شۆخو شەنگ دەگرێ.
ئەگەر پێوەی رۆیشت لەکارێکی چاکەدا سەفەردەکات.

*ئەگەر تاڵی نەعلەکانی بینی پچڕاو پینەی پێوەبوو ژنێکدەهێنێ کوڕێکی هەیە.
*ئەگەر نەعلەکەی پاژنەی نەبوو ژنەکەی هەرگیز دووگیاننابێت.
*ئەگەر بەتاکە نەعلێکەوەچوو بەرێوە لەژنەکەی یان شەریکەکەی جیادەبێتەوە.
*ئەگەر نەعلەکانیدا بەمووروکونکرد کاری دەویتی دەکات بۆ ژنەکەی.
*ئەگەر بینی نەعلەکانی کەوتە نێو ئاوەوەو ونبوو ژنەکەیدەمرێ، ئەگەر دۆزییەوەو لەئاوەکە دەریهێنا لەنەخۆشییەکەی بەئاگادێت دوای ئەوەی نزیکدەبێتەوە لەلێواری مردن.
*ئەگەر بینی نەعلەکانی داکەند دەستەلاتو پۆستێك وەردەگرێ بەپێی ئایەتی: ﴿ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ اِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى ﴾ (طه: ١٢)لەدوای ئەوە دەستەلاتو سەرکەوتنی بەسەر (فیرعەون)و گەلەکەیدا بەدەستهێنا.
*ئەگەر هەردوو تاکی نەعلەکەی دزرا دەگونجێت گوێدرێژو ئاژەڵەکەی بدزرێ.
*ئەگەر نەعلەکەی پینەکرد حاڵو باری ژنەکەی بەخراپە باسدەکات.
*نەعلی کەتانی ژنێکی داپۆشراوی قورئانخوێنە.
*هەروەها گوتراوە: نەعل بەڵگەیە لەسەر برا.

**نەعنا**[1]: (ئیبن سیرین)دەڵێت: شیوەنو لاواندنەوەیە.
(نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر شیوەنو لاواندنەوە، سەرجەم پاقلەواتەکانیش غەمە چونکە چەوری تیانییە.
**نەفرەتبارکردن**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا نەفرەتبارکرا بەڵگەیە لەسەر سوێندخواردنو گومان لەمارەبڕینو بژێوی پەیداکردندا.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دووریو دەرکردن.
**نەمریی( مانەوە )**: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:
+دڵەراوکەو دوودڵی.
+خۆشاردنەوە.
+گوێگرانی بۆ یەکێك بەدەست ئێشو ئازاری گوێچکەوە گرفتاربێت.
*ئەگەر لەگەڵ مردوویەکدا بینی لەدۆزەخدایە بەپێی ئایەتی: ﴿ وَذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (السجدة: ١٤).
*دەگونجێت لەبەهەشتدا نیشتەجێبێت.
*پیاوێکی کوێری دەستکورتو هەژارە.

---

[1] **نەعنا**: گیایەکە وەك پونگە وایە بەلام گەلاکەی کاڵترەو تامەکەی تونترە بۆ خواردنو چارەسەری نەخۆشی بەکاردێت. "فەرهەنگی دەریا: ٢/١٤٦٥".

*گوترایشه پیاوێکی فێڵبازی خراپەکارە.
*دەگونجێت بینینی ئەو حاڵە بەڵگەبێت لەسەر مانەوەو جێگیربوون لەشوێن‌و جێیەك.
**نەوت:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: نەوت ماڵێکی حەرامە، گوترایشە: ژنێکی خراپەکارە، ئەوەی نەوتی پێدابکرێ خراپەی لەلایەن دەستەڵاتدارەوە پێدەگات.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر نەوتی خواردەوە ماڵ‌و سامان‌و دەستەڵاتدارێتی لەلایەن دەستەڵاتدارەوە پێدەبەخشرێ.
*ئەگەر نەوتکرا بەسەریا بەڵاو نەهامەتی لەلایەن دەستەڵاتدارەوە پێدەگات.
*نەوت شەڕو بەڵاو نەهامەتی‌و جەنگە.
**نەورۆز:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا خۆشی‌وشادی بەسەرچاوە یان رابردوویەکە کەدەگەڕێتەوە بۆی‌و لەغەمو پەژارە قوتاردەبێت، پاشان دەگەڕێتەوە بۆی یان ماڵ‌و سامانێکی بۆ دەگەڕێتەوە کەلەکیسیچووە.
*ئەگەر لەخەودا رۆژی نەورۆزی بینی‌و ئەو رۆژە هاوتابوو لەگەڵ رۆژی هەینیدا (نیل)مامناوەندی دەبێت‌و بشێوی دەکەوێتە (میسر)ەوە.
*ئەگەر رۆژی شەممەبوو(نیل) دەسووتێ‌و لەسەرزەوی نامێنێت‌و ساڵێکی قورس‌وگران‌و پڕنەهامەتیدەبێت.
*ئەگەر رۆژی یەکشەممەبوو (نیل) مامناوەندیدەبێت لەدەرکەوتنیداو زستانەکەی سەخت‌و کشتوکاڵ فرە فەرپیت‌و زۆردەبێت.
*ئەگەر رۆژی دووشەممەبوو (نیل) پیرۆز دەبێت ئەوجا کشتوکاڵ تووشی بەڵاو نەهامەتی دەبێت.
*ئەگەر لەرۆژی سێشەممەدابوو (نیل) درێژ دەبێتەوە دوای ئەوەی دەوەستێ‌و دەکەوێتە نێوەڕاست پاشان زیاددەکات.
*ئەگەر رۆژی چوارشەممەبوو (نیل)مامناوەندیدەبێت‌و زۆر لەسەر زەوی نامێنێتەوە بەڵکو بەخێرایی دادەبەزێ لەنێوان هاوین‌و پایزداو سەرمایەیەکی سەختدەکەوێتەوە.
*ئەگەر رۆژی پێنجشەممەبوو (نیل) پیرۆز دەبێت‌و لەوساڵەدا هەڵناچێت مەگەر ئاژەڵ کزوکەمبێت ، هەموو ئەم لێکدانەوانە هی (بەتلیمۆس)ە سەبارەت بە(میسر) گوتویەتی.
**نەهەنگ:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر:
+سوێند.
+پەرستگای پیاوچاکان.
+مزگەوتی خواناسان.
+غەم‌و پەژارە.
+لەدەستچوونی پلەوپایەو دابەزینی خەشم‌و قین.

*بینینی (نەهەنگ)ی حەزرەتی (یونس)(سەلامی خوای لێبێت) دڵنیاییە بۆ کەسێك بترسێ‌و دەوڵەمەندییە بۆ هەژارو نەدارو دەرووی خێرە بۆیەکێك لەناڕەحەتیدابێت، موڵك‌و دەستەڵاتیشە بۆیەکێك شایستەی بێت، هەروەها بینینی زیندانەکەی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت) لەگەل شوێنی هاوەڵانی ئەشکەوت‌و تەنورەکەی (نوح) (سەلامی خوای لێبێت).

**نەهێشتن:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا شتێکی باش تیادەبات ئەوەی لەسەریەتی لێی تێکدەدرێت یاخود گەواهی‌و پەیمان دەشکێنێ یاخود مەزهەبێکیتر دەگرێتەبەر یاخود کچێك دەکات بەهاوسەری خۆی.

*ئەگەر ئەو شتەی خراپیکرد وەك ئەوەی لەئاڵتون‌و زیوو دروستکرابوو دەگونجێت بەرانبەر ئاڵتونچیەك قسەی ناباش‌و خراپ لەزاری هاتبێتە دەرەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رق‌وقین چونکە هۆکاری نەهێشتن‌و تیابردنی یەکێتی‌و تەباییە.

**نەهێنی:** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا هاوسەرگیرییە، ئەگەر بینی بەنهێنی بەڵێنیدا بەژنێك مەبەستی مارەبڕینێتی چونکە عەرەب مارەبڕین بەنهێنی ناودەبات.

*ئەگەر مرۆڤێك بەنهێنی بەڵێنی پێدا مەبەستی مارەبڕین‌و هاوسەرگیرییە لەگەڵیدا.

*ئەگەر مرۆڤێك بەنهێنی بەڵێنی پێداو لەخەونەکەدا بەڵگەیەکی تێدانەبوو لەسەر هاوسەرگیری ناڕەحەتیەك لەلایەن ئەوەی نەهێنی لا دەدرکێنێ دادێت بەسەریا.

## ن ی

**نیاز (مەبەست):** (نابلسی) دەڵێت: لەبوونی نیاز لەخەودا بۆ رەبەن هاوسەرێکی شیاوو گونجاوە یاخود بژێوییە یان دواکەوتنی مەزهەبێکیترە.

*ئەگەر بینی بەهێمنی‌و مەبەستەوە دەڕوات بەرێوە خۆی بەکەمدەزانێ لەبەرخوا.

**نیسك:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵێکی حەڵاڵە ئەگەر روابوو، هەروەها دەڵێن: غەم‌و پەژارەو رزقێکی خراپ‌و بەدە.

**نیشتگە:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەبازاڕدابوو ماڵ‌و سامانێکی کەم دەبینێ یان کردارێکی کەمە یا هاوسەرێکی قایلی باشە.

*ئەگەر نیشتگەیەکی لەماڵدا بینی بەڵگەیە لەسەر خۆشی‌وشادی یان هاوسەرو کوڕ، باشی نیشتگە بۆ مردوو بەڵگەی لەسەرئەوەی مردووەکە لەبەهەشتدایە.

*نیشتگە سوێند یان پەیمانە، دەگونجێت گرێبەستی شەریکایەتیبێت.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی لەترس‌وبیم‌و پارێزراوی لەناڕەحەتی.

**نیشتنەوەی ئاوساویی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی کەسێك بۆ نیشتمانەکەی‌و پەشیمانبوونەوەی تووڕەو هێوربوونی‌و کەسێك جیابووبێتەوە لەخزمەکانی و پاشاندەگەڕێتەوە بۆ لایان، یاخود گەڕانەوەی ئەو شتانە بۆسەر حاڵ‌وباری پێشووی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لەدەستچوونی پلەوپایە.

**نیگارکێش:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر وەرگرتنی ئامۆژگاری یان راوبۆچوون یاخود بەڵگەیە لەسەر خاوەن راو موڵکدارو بەشداریکردن لەهەموو زانیاریەکدا.

*نیگارکێش خاوەنی بڕیار بەچاکەو رێگرییە دەگونجێت ئەندازیاربێت.

**نیمس**[1]: (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر بینی مریشکدەخوات.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بەربەرەکانی لەگەڵکرد کێشمەکێش لەگەڵ زیناکارێکدا دەکات.

**نینۆك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بوونی بەلاو نەهامەتی لەنینۆکدا بەڵگەیە لەسەر لاوازی توانین‌و تێکچوونی کاروباری ئایین.

*هەروەها دەڵێن: درێژی نینۆك غەم‌و پەژارەیە.

*ئەگەر بینی بێنینۆکە زوو بێپارەوپوول دەمێنێتەوە.

*ئەگەر بینی هەموو نینۆکەکانی شکاوە دەمرێت ، هەروەها ئەگەر بەسەوزی بینی بەوشێوەیەیە.

(نابلسی) دەڵێت: نینۆك لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زاڵبوون بەسەر دوژمندا، دەگونجێت درێژی نینۆك بۆیەکێك ئاتاجبێت پێی لەسەر رزق‌و رۆزی بەرین‌و فراوان بەپێچەوانەی ئەوەی ئەگەر بەکورتکراوەیی بینی.

*دەگونجێت درێژی نینۆك بەڵگەبێت لەسەر نکوولی لێکردن چونکە درێژی نینۆك وازووی سوننەتە.

*نینۆك هێزو توانای پیاوە ئەگەر بینی نینۆکەکانی درێژبوون‌و دڵنیاییە لەوەی ناشکێن زیادبوونی هێزو ماڵ‌و چەك‌و بەرگرییە لەبەرانبەر دوژمنەکانیدا.

*ئەگەر نینۆکەکانی هەڵکێشراو نەما تواناو هێزی نامێنێ.

*ئەگەر نینۆکی بەشێوەیەکی ئاساییکردو سنووری ئاسایی نەبڕی ئەوکەسە پێبەپێ شوێنی سوننەت کەوتوە.

*درێژبوونی نینۆك بۆ چەکداران زیادبوونی چەك‌و هێزە ، ئەگەر لەدرێژیدا لەسنوور دەرچوو خراپە.

---

[1] **نیمس:** گیاندارێکە بەقەد پشیلەیەك دەبێت‌و دەست‌و قاچی کورتە‌و ملی درێژە راوی مشك‌و ماردەکات‌و دەیخوات‌و چەند جۆرێکیشی هەیە .

(فەرهەنگی دەریا: ٢/١٤٩٤)

*ئەگەر بینی نینۆكی لەنینۆكی دوژمنەكەی درێژتر زاڵدەبێ بەسەر دوژمنەكەیدا.
*ئەگەر نینۆكەكانی كەوتن ماڵو دارایی لەدەستدەداتو ناتوانێت ویستوخوازی بەدەستبهێنێ.
*نینۆككردن شوێنكەوتنی سوننەتە، یان ماڵو ساماندان بەقەرزە، ئەگەر بۆیەكرابوو قەرزەكە زێڕ دەبێ.
*سپیبوونی نینۆك بەڵگەیە لەسەر لەبەركردنو تێگەیشتن.
*بینینی نینۆك لەئەندازەی خۆیدا چاكی ئاینو دنیایەو شەڕەنینۆك بەڵگەیە لەسەر كۆكردنەوەی دنیاو دەستبڕین تێیدا.
*درێژی نینۆكو جوانی ماڵو دارایيو ئامادەكردنی چەكە دژ بەدوژمن یان بەڵگەیە یاخود ماڵو سامانەو لەشەڕو خراپە یان خۆی پێدەپارێزێ.
*درێژبوونی نینۆك بەئەندازەیەك لەشكاندنی بترسێ بەڵگەیە لەسەر تێكچوونی كاروباری كەسانیتر بەدەستی ئەو، ئەگەر نینۆكی كورتكردەوە سەرفیترەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان دەردەكات.
*ئەگەر بینی نینۆكەكانی كەمن یاخود دەرهێنراون یان شكاوە تیاچوونی ماڵو داراییەتی لەدنیادا.
*ئەگەر نینۆكەكانی بوون بەچنگ زاڵدەبێت بەسەر نەیارەكانیدا یان لەجەنگدا سەردەكەوێ بەسەر دوژمندا.
*ئەگەر بینی بەنینۆكەكانی چارەسەر دەكات لەدنیادا دەستبڕی دەكاتو دەداتە پاڵ نەفسی خۆی، ئەگەر نینۆكی نەبوو بێپارە دەبێتو توانای نامێنێت.

## ن ی

**نێچیر**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بێناگایی هەندێك لەخواناسان ، ئەوەی شوێنی نێچیر بكەوێ، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شوێنكەوتنی ئارەزوو لەگەڵ بێئاگاو سەرلێشێواوان.

**نێربازی**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: هەندێكدەڵێن: بەڵگەیەلەسەر زاڵبوون بەسەر دوژمندا.
*هەندێكیتر دەڵێن: هەژاردەكەوێو ماڵوسامانی خەرجدەبێ.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی لاوێكی ناسراو مارە دەكات بكەرچاكە لەگەڵ كارپێكراو دەكات، ئەگەر بینی منداڵێكی بچووك دەهێنێ كارێكی نەشیاو ئەنجامدەداتو كارێكدەكات ناقۆڵایە.
*ئەگەر بینی پیاوێكی نادیار مارەی دەكات دوژمنەكەی زاڵدەبێت بەسەریا، ئەگەر دوژمندارنەبوو شكۆمەندیو ماڵو دارایی تووشی شكستدەبێ.
*ئەگەر بینی پیاوێكی ناسراو مارەی دەكات پەیوەندییەك لەنێوانیاندا دەبێت یاخود بكەرو كارپێكراو

هەردووكیان لە سەر شتێكی خراپ كۆدەبنەوە.

*ئەگەر بینی دەستەلاَتدارێك مارەیكرد ماڵو سامانێكی زۆری دەستگیر دەبێ لەگەڵ پلەوپایەدا.

*ئەگەر ئەو دەستەلاَتداری مارەكرد سەرجەم ماڵوسامانی تیادەچێت.

**نێرگز:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەگەر تاجەگوڵینەیەكی لەنێرگز بەسەری خۆیەوە بینی ژنێكی شۆخو شەنگو جوان دەهێنێ یان كچێكی جوان دەهێنێ بەلاَم زۆر ناخایەنێت .

*ئەگەر ژنیش بینی بەسەریەوە بەهەمان شێوەیە. ئەگەر مێرداربوو تەلاَقیدەدات یان دەمرێت.

*ئەگەر نێرگزی بینی لەبێستانو باخچەكەیدا روابوو كورێكە دەمێنێتەوە، ئەگەر براببوو یان خراپبوو نامێنێتەوە.

*دەگێرنەوە ژنێك لەخەودا دەبینێ مێردەكەی چەپكێ گوڵی نێرگزی پێدەدات ، هەویەكەشی چەپكێ مۆردی پێدەدرێ ، خەوەكەی بۆ راڤەكارێكی خەو دەگێرێتەوە ئەویش دەڵێت: مێردەكەت تۆ تەلاَقدەداتو دەست دەگرێ بەهەویەكەتەوە.

*پیاوێك چوار ژنی هەبوو لەخەودا بینی چوار تۆپەڵ نێرگز بەجیا لەسەر رۆخی روبارێك رواوەو سیانی بەر بەرداو چوارەمیشی دایە بەریەرد بەلاَم بەرنەكەوتخەوەكەی بۆ راڤەكارێكی خەو گێرایەوە وتی: چوار ژنت هەیەو سیانیان تەلاَقدەدەیتو چوارەمیان دەهێڵیتەوە.

*هەروەها گوتراوە: زەردی نێرگز بەڵگەیە لەسەر دیناری سپێتی درهەمەو خەوبینەر بەدەستیدەهێنێت.

*هەندێكدەڵێن: نێرگز شادیو خۆشییە.

(نابلسی)دەڵێت: نێرگز ماڵوسامانە لەزێرو زیوو، زەردییەكەی دینارەو سپێتی درهەمە.

*نێرگز بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژیو چەمانەوەو سپێتی سەر.

**نێرەكەناچە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: كورە بۆ یەكێك هاوسەرەكەی دووگیانبێت، هەروەها پیاوێكی جەنگاوەرە.

**نێرەمووك:** بەیەكێك دەگوترێ عەورەتی ژنو پیاوی بەیەكەوەهەبێت، بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دووڕوو یان پشوودان یاخود خراپەو روو لەگومانكردن.

*ئەگەر پیاوێك بینی عەورەتی ژنی هەیە لەگەڵ عەورەتی خۆی بەوچەشنەیە كەلێی دواین .

*ئەگەر مرۆڤێكی نێرەمووك بینی بەتەنیا هەر عەورەتی پیاوی هەیە بەڵگەیە لەسەر تەوبەكردنی لەوەی ئەنجامیداوەو رووكردنەیەكبارو حاڵ، ئەگەر هاوسەرداربوو لەژنەكەی

جیادەبێتەوە یاخود واز لەهەندێك هۆكار یان دایكیدەهێنێت.

**نێرینەی حوشترمورغ**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێكی خەسێنراو یان دەشتەكییە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی سەریبڕی لەدواوە كاری نێربازی لەگەڵ خزمەتكاری ئەنجامدەدات.

*ئەگەر حوشترمورغێكی نێرینەی دۆزییەوە لەلای ئیمام دەستەڵاتو دادگاو زانیاری بەدەستدەهێنێت، وەگەرنا دادوەرەكە دەچێتە ژێردەستی یان بەئەندازەی شایستەبوونی خۆی پۆستی دەستەڵات وەردەگرێ.

*ئەگەر سواری حوشترمورغبوو سواری ئەسپو ئوتومبیلی پۆستەبەردەبێ.

**نێزە( رمی بچووك )**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا هێزو دەستەڵاتە ئەگەر چەكی لەگەڵدابوو یان ئاسن، وەگەرنا كوڕێكی بەهێزو پتەوە یان بازرگانیەكی بەسوودو قازانج لەگەڵ بژێوییەكی بەكەڵكو سوود.

*ئەگەر هەزارێك بینی دەوڵەمەند دەبیّو ئەگەر دەوڵەمەندبینی پتر دەوڵەمەنددەبێ یاخود دەستەڵاتداریّ، ئەوجا دەستەڵاتەكەی بەهێزدەبیّو زەرەر بەدوژمنەكانی دەگەیەنیّو حاڵوباری باشدەبیّ.

(نابلسی)دەڵێت: گوتە یان سوودو قازانجە بەهۆی سەفەرەوە.

*نێزەی قورقوشم نامەیەكە لەلاوازیو سستیدا دەنوسریّو لەژێریش خۆشی دنیایە یان نامەیەكە بەزۆر نوسراوە.

# و واو

## وا

**واشە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: واشە لەخوار بازەوەیە لەدەستەڵاتو پلەدا، هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی واشەیەکی گرتوە بەدەستی خۆی دزێك لەسەر دەستی ئەودا دەستگیردەکرێت.

*ئەوەی ببینێ واشەیەك لەدامێنی دەردەچێت کوڕێکی ئازاو جەربەزەیدەبێت.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆ لای (سەعید)ی کوڕی (مسیب)و دەڵێت: لەسەر پەنجەرەکانی مزگەوت کۆتری سپیم بینیو زۆر سەرسامبووم بەجوانی ئەو کۆترانە، پاشان هەڵۆیەك هاتو بردنی. (ئیبن مسیب) دەڵێت: ئەگەر خەوەکەت راستبێ (حەجاج) کچی (عبدالله)ی کوری (جەعفەر) دەهێنێت ، پاشان ئەوەندەی بەسەرا رانەبورد (حەجاج) کچی (جەعفەر) ی هێنا، پاشان لە(ئیبن مسیب) یان پرسی چۆنزانیت ئەوە روودەدات؟ ئەویش لەوەلأمدا وتی: کۆتر ژنە، کۆتری سپیش ژنی خاوەن رەچەڵەکو پاکو بێگەردە.

(نابلسی) دەڵێت: واشە لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پادشاو دەستەڵاتدارێکی نەزانو ستەمکار، ئەوەی واشەیەك بەدەستی خۆیەوە ببینێ خەڵکی لاوازو بێدەستەڵات هەڵدەبژێرێ.

*ئەوەی واشەیەك ببینێ پیاوێکی ستەمکاری بەدوخراپی دەبینێت ئەگەر بەچکەکەی ببینێ منالی نێرینەیدەبێت.

*(دمیری) دەڵێت: واشە لەخەودا دزە یان کوڕو وەچەی نێرینەیە.

## وت

**وتاربێژ:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی وەك ئەوەی وتاردەدات بەلأم خۆی وتاربێژ نەبوو هیچ کەسێکیشی توانای وتاردانی نەبوو لێکدانەوەی دەگەڕێتەوە بۆ

هاوچەشنەکەی یان ئەو بەڵاو نەهامەتیە رووی تێدەکات یاخود بەچاکەکار ناوبانگدەردەکات.

*ئەگەر بینی وتار بەباشیدەداتو نوێژەکەی باشەو بەرنوێژی بۆ خەڵکیدەکاتو دواتر گوێبیستی وتارەکەی بوون دەبێت بەفەرمانڕەوایەکی بەگوێکراو ئەگەر تەواوینەکرد فەرمانڕەواییەکەی تەواو نابێتو لەسەرکار لادەبرێت.

*ئەگەر بینی ناموسوڵمانێك وتاردەدات موسوڵماندەبێت یاخود کتوپڕ دەمرێت.

*ئەگەر ژنێك بینی وتار دەداتو مۆچیاریو ئامۆژگاریدەکات هێزو توانایە بۆ بژێوی پەیداکاری ، ئەگەر قسەکانی لەوتاردانەکەدا دانایيو ئامۆژگاری نەبوو ئابڕووی دەچێتو ناوبانگدەردەکات بەکارو پیشەی ناڕەوای ژنانە.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر پاکێتیو ملکەچیو تەوبە لەگوناهو تاوان لەگەڵ گریانو پلەوپایەی بەرزو تەمەندرێژیو پەیوەندی لەگەڵ تاکی باوەڕداردا.

*هەروەها وتاربێژ بەڵگەیە لەسەر:

+فەرمانبەرداری بەچاکەو رێگری لەخراپە.

+ئاهەنگو کۆبوونەوە لەبۆنەکاندا.

*ئەگەر ژنێکی رەبەن بینی بەڵگەیە لەسەر هەوڵدانی لەدەستنیشانکردن بۆ خۆی، ئەگەر بینی بوە بەوتاربێژو شایستەی وەرگرتنی پۆستبوو پلەوپایەو پۆستێك وەردەگرێت شایستەیدەبێت بەپێی توانای خۆی.

*ئەگەر لەخەوەکەیدا مەرجەکانی وتاری تێدابوو پەناوپشتگیری دەکرێ لەکاتی ئەوەی پێدەسپێرێ.

*ئەگەر جلوبەرگی پۆشی قەرەبووی بۆ دەکرێتەوەو رزقی دەجووڵێت، ئەگەر جلوبەرگی رەشی پۆشی بەڵام وتارینەدا بۆینەکرا یان دانیشتبوو قسەو گوتەی بەسەر خزمەکانیدا دەڕوات یاخود بەڵاو نەهامەتیەك رووی تێدەکاتو ئابڕووی دەچێت.

*ئەگەر فەرمانڕەوای بینیو وتارەکەی بڕیو تەواوینەکرد دەستەڵاتو فەرمانڕەوایی بەسەردەچێتو دەڕوات.

*ئەگەر ژنێك لەخەودا بینی وتاردەدات هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی چاكو باشدەبەستێ، ئەگەر لەرۆژی هەینیدا وتاریدا هەروەك چۆن وتاربێژو وتاردەدات مێردەکەی تەڵاقیدەداتو کوڕێك بەزینا دەخاتەوە.

**وتنی "لا اله الا الله"**:(نابلسی)دەڵێت: وتنی (لا اله الا الله) لەخەودا ڕێنوێنیە، یاخود لەسەر شایەتیدان دەمرێت و پاداشتدەدرێتەوە، ئەگەر لەغەم و پەژارەدابێت پاداشتدەدرێتەوە.

## و ر

**ورچ**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ورچ پیاوێکی توندوتیژە لەحاڵ و باری خۆیداو پیس و گەندەڵە لەویست و ئیرادەیا، هەروەها ناپاکێکی پیس و گەندەڵە لەناخدا خۆی تاقیدەکاتەوە.

*هەروەها دەڵێن: دوژمنێکی دزو گێلەو هەمیشە دژایەتیدەکات و نێرەموکێکی دەستبڕەو قۆڵی حاجی و کاروانەکان دەبڕیّ و توێشوو شتومەکیان دەدزێت.

*ئەگەر سواری ورچێکبوبوو پلەوپایەو دەستەلاتی دەستگیردەبێت، وەگەرنا ترس و بیم و تۆقان زاڵدەبێت بەسەریاو پاشان قوتاردەبێت لێی.

*هەروەها دەڵێن ورچ بەڵگەیە لەسەر ژن.

(نابلسی)دەڵێت: ورچ بەڵگەیە لەسەر ژن و سەفەرو پاشان گەڕانەوە بۆ شوێن و جێگەی خۆی ، هەروەها دەڵێن: ورچ ژنێکی زیناکارە ئەوەی سواریدەبێت با ئاگاداربێت تووشی زینا نەبێت.

(دمیری) دەڵێت: دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر دیلی و زیندانیکردن.

**ورچەوان**: (نابلسی)دەڵێت: بەوکەسە دەگوترێت ورچ دەگرێت و مەشقی دادەدات و فێری سەماو دووبارەکردنەوەی جموجوولّی مرۆڤیدەکات، بینینی بەڵگەیە لەسەر پەروەرشیاری خەڵکی نەزان یان ئافرەتی گۆرانیبێژو خاوەنکارو کاسبی حەرام وەك خاوەنی تیاترۆخانە.

**وردەواڵەفرۆش**[1]: (ئیبن سیرین) دەڵێت: وردەواڵەفرۆش ئەدیب یان زانایەکە یاخود خواناسێکە لەبنەڕەتدا پیاوێکە بەباشە باسیدەکریّ.

(نابلسی)دەڵێت: هەرکەسێك لەگەڵی دابنیشیّ ئەدەب و پیاهەڵدانی باش و خۆشی و شادی لێوەردەگریّ مەگەر بخورد بسووتێنیّ ئەوەش پیاهەڵدانێکی ترسێنەرە.

*هەروەها دەڵێن: وردەواڵەفرۆش قژداهێنەرە.

*بینینی و بەدەستهێنانی ستایشەو پیاهەڵدانی باشە.

---

[1] **وردەواڵەفرۆش**: لەژێرئەم ناونیشانەدا دەستگێڕو چەرچی و بۆنفرۆش و وردەواڵە لەهەموو بابەتێك جێیدەبێتەوە. (وەرگێڕ)

## وش

**وشتر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: وشتر ژن یان ساڵ یا دار یاخود کەشتی یادارخوما یا بەشێکی دنیایە بۆ یەکێك ببێت بەخاوەنی یاخود سواریبێت، ئەگەر رەبەنبوو هاوسەردەگرێ، یان سەفەردەکات ئەگەر لەسەفەردابوو، وەگەرنا دەبێت بەخاوەنی ماڵو زەوی یان پۆستی پارە کۆکردنەوە، ئەگەر وشترەکەی دۆشی سوودو قازانج دەکاتو مەگەر بەدەم بیمژێ ئەوکات ملکەچیو رسوایی رووی تێدەکات.

*کەژاوەو گومەزو دەستەبەرە هەموو ئەوانە ژنن چونکە وەك چەتر وان یان بۆ هەڵگرتنە.

*ئەگەر وشترێکی نادیاری بینی شیری لێدەهات لەمزگەوت یان نێو کێڵگەدا ساڵێکی بەفەرپیتە مەگەر خەڵکی لەئابلۆقەو ترس‌وبیمو فیتنەدابن ئەوکات لادەچن بەهۆی سروشتی خۆیەوە چونکە شیری وشتر سوننەتو پاکیی سروشتە.

*وشتری عەرەبی دەدرێتەپاڵ ژنێکی رێزدار.

*هەروەها گوتراوە: گۆشتی وشتر بەلێنراوی رزقێکی حەلاڵەو گوتراوە بەجێهێنانی نەزرە بەپێی ئایەتی:﴿كُلُّ الطَعَامِ كَانَ حِلاً لِبَنِي اسْرَائِيلَ الاَّ مَا حَرَّمَ اسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ﴾ (ال عمران: ٩٣).

*هەروەها دەڵێن: وشتری شیردەر بۆیەکێك سواری ببێت ژنێکی باشەو دەستدان لەبەچکەی وشتر غەمو پەژارەو سەرقاڵییە.

*لە(ئیبن سیرین)ەوە دەگێڕنەوە پرسیاری لێکراوە دەربارەی پیاوێك وشتری بینیوە، ئەویش وتویەتی: هاوسەردەگرێ، یەکێکیر پرسیاری لێکردوە وشتری لێخوڕیوە ئەویش گوتویەتی: پلەوپایەو گوێڕایەڵی ژنە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا ژنە، ئەگەر ژنێکی فالگرەوەبوو عەجەمەو ئەگەر فالگرەوە نەبوو ژنێکی عەرەبییە.

*ئەگەر وشتری دۆشی ژنێکی باڵغدەهێنێت، ئەگەر هاوسەرداربوو کوڕێکیدەبێت.

*ئەگەر وشتری دۆشی دەستەلاتێك وەردەگرێ پارەی تێدا کۆدەکاتەوە بۆ دەوڵەت.

*ئەگەر بەهەڵەوگەڕاوی سواریبوو لەداوەدەچێتە لای هاوسەرەکەیو سەفەرەکەی بەتاڵدەبێتەوە.

*دەگونجێت وشتر ژنێکبێت زۆر شەڕبکات بەهۆی زۆری هاوارو دەنگەدەنگی.

*ئەگەر وشترێکی بینی چوە نێو شارێکەوە فتنەیە بەپێی ئایەتی: ﴿إِنَّا مُرْسِلُوا النَّاقَةِ فِتْنَةً لَهُمْ﴾ (القمر:٢٧).

*ئەگەر وشترەکەی سەربڕی پەشیماندەبێتەوە لەکردارێك کەئەنجامیداوە یاخود بەڵاو موسیبەت بەسەریادێت.

*ئەگەر وشترێك لەشارێکدا سەربڕا خەڵکەکەی تووشی بەڵاو نەهامەتی دەبن.

*ئەگەر بوو بەخاوەنی وشتر هاوسەردەگرێ یان خزمایەتی دروستدەکات یان دەبێت بەخاوەنی ماڵو زەوی.

*ئەگەربینی وشتر دەدۆشێ ماڵێکی حەلاڵ لەژنێکەوە بەدەستدەهێنێ، ئەگەر بەدەر لەشیر خوێنو کێمی لێدۆشی ئەوجا ماڵەکە حەرامدەبێت.

*ئەگەربینی شیری وشترێکی خواردەوەو بەبێئەوەی خۆی بیدۆشێ ماڵو سامان لەپیاوێکی گەورەی دەستەلاتدارەوە بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر وشترێك رۆیی یان ونبوو لێی یاخود لێیان دزی لەژنەکەی جیادەبێتەوە.

*وشتر ژنێکی ساڵحی بەئارامە لەسەر ناڕەحەتیو بارو ئەرکی قورسی هەڵگرتوە وێڕای رێزداریو فەرپیت.

*دەگونجێت وشتر بەڵگەبێت لەسەر ساڵیداهاتوو، ئەگەر بەچکەکەی لەگەڵدابوو بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی نیشانەیەكو رووداوی فیتنەیەکی گەورە.

*ئەگەر وشترەکە سەربڕا بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو تیاچوون کەهەموو خەڵکی دەگرێتەوە.

*ئەگەر وشترێکی کڕیو خۆشی هەژاربوو دەگونجێت چرایەك بکڕێ یان لەوانەیە پلەوپایەو پشکێ بەدەستبهێنێت.

(دمیری)دەڵێت: پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکم بینی وشتری دەدۆشی پاشان شیرەکەیبوو بەخوێن (ئیبن سیرین) وتی: ئەوە پیاوێکە دەبێت بەبەرپرسی عەجەمیەکانو زەکاتیان لێوەردەگرێ پاشان ستەمیان لێدەکاتو ماڵیان بەزۆر داگیردەکات ئەمەش خوێنەکەیە.

**وشکبوون**: (نابلسی)دەڵێت: وشکبوونی لەشولار یاخود گەلای تەڕ بەڵگەیە

لەسەر هەژاریو ژنێکی سەختو گرانو نەبوونی پشووماندو دەرکردن.

**وشکی :** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر نەخۆشی وشکبوونەوەی بینی ماڵو سامانی لەکارێکی بەدەر لەرەزامەندی خودا یا خەرجدەکات، هەروەها قەرز لەخەڵکیدەکاتو پاشان زیادەڕەوی دەکات لەخەرجکردنیداو نایداتەوەو خوداوەند سزای دەدات .

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی لەترسو بیم بەپێی ئایەتی: ﴿فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقاً فِي الْبَحْرِ يَبَسَا لاَتَخَافُ دَرْكَاً وَلاَ تَخْشَى﴾ (طه: ٧٧).

## ول

**وڵاخ( ئاژەڵ)**: (نابلسی)دەڵێت: ئەگەربینی وڵاخو ئاژەڵەکەی سەربڕاوە مەرگی کوڕەکەیەتی.

*ئەگەربینی ئاژەڵێکی پێکاوە دەستدرێژیدەکاتە سەر مناڵێك.

*ئەگەر ئاژەڵەکەی سەربڕی ماڵو دارایییەکی بەهۆی کوڕەکەیەوە دەستدەکەوێت یان ماڵو دارایییەکی کەمی دەستدەکەوێت.

*ئەگەر بۆ گۆشت وڵاخەکەی سەرنەبڕی کوڕێکی دەمرێت یان کوڕێکی خزمی.

*ئەگەربینی ئاژەڵێکی سەربڕیوە یان بەرخێك یاخود سواری یەکێکیانبوە گاڵتەو سووکایەتی بەمنداڵان دەکات.

*ئەگەربینی گۆشتی وڵاخێك دەخوات ماڵێکی کەمی لەمنداڵێکەوە دەستدەکەوێت.

## ون

**ونبوونی شێر**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ناخۆشیو ترسان راچڵەکینو شوێنی خراپەکاران.

**ونکراو( دیارنەماو )**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر رزقو خێر.

*دەگونجێت شتی ونبوو بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی بەرزدەبێتەوە لەخورماو مێوژو گەنمو جۆ، ئەوشتە ونبوانەی لەخەودا تووشی نوقمبوون یاخود سووتاندەبێت ناتەواوییە لەوەی باسمانکرد لەبەروبوومەکەیدا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بژێویو رزقو رۆزی یاخود ژنی یارمەتیدەر یان مێردی بەئارام لەسەر پەیداکردنی بژێوی منداڵەکانی، ئەگەر زیادەی تێدا رووداو زیادبوونی فەرو خێرو رزقە تێدا.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تیاچوونی تەمەن لەبێئاگاییو نەچەشتنی تامو چێژو خۆخەریککردن لەبەدەستهێنانی زانیاریدا.

**وه**

**وەدی:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: وەدی ماڵو سامانێکە نامێنێتەوە لەگەڵ پەشیمانیدا.

**وەزغە**[1]: (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکی سستو لاوازە فەرمان بەخراپە دەکاتو رێگری لەچاکە.

(نابلسی)دەڵێت: پیاوێکی قسەهێنەرو قسەبەری فیتنەیە نێوانی خەڵکی تێکدەدات.

*ئەگەر بەدەستیهێنا پیاوێکی لەو جۆرە دەپێکێ.

*ئەگەر گۆشتەکەی خوارد غەیبەتی مرۆڤێکدەکاتو درۆی بۆ هەڵدەبەستێ.

*ئەگەر ئەو گیاندارە گۆشتی ئەوی خوارد مرۆڤێك غەیبەتو باسیدەکات.

*بەڵگەیە لەسەر دوژمنو ئەوەی گوناه دەکاتو قسەی خراپدەکاتو لەجێگەیەکەوە دەچێت بۆ جێگەیەکیتر.

**وەزیر:** دەگونجێت بینینی وەزیر لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر شکۆمەندیو دەسەڵاتو فەرمان بەسەر بردن یان بەدەستهێنانی پێداویستی لەلای دەسەڵاتداران.

*ئەگەر بینی بوە بەوەزیرو حوکمی کەسانی خوارخۆیدەکاتو شکۆمەندیو رێزی بەدەستدەهێنێت لەگەڵ تەوبەیەکی پەسەند، ئەگەر شایستەی ئەوەنەبوو گوناهو تاوانی کەسانیتر هەڵدەگرێ لەهی خزمو کەسوکاری.

*ئەگەر خوازیاری وەزارەتبوو دەگونجێت ورێنەگربێت بەپێی ئایەتی: ﴿ كلا لا وزر ﴾ (القيامة: ١١).

*دەگونجێت لەگەڵ یەکێك لەدایكو باوکیدا خراپ بێت یان لەگەڵ مامۆستاو شەریكو ئەوەی فەرمانی بەسەریا دەڕوات.

*ئەگەر بینی بوە بەوەزیری دەسەڵاتدارو لەبەردەستدایە دەسەڵات بەجێدەهێنێ.

**وەستانی عەرەفات:** (نابلسی)دەڵێت : ئەگەر بینی لەعەرەفات وەستاوە پلەوپایەکەی دەگوێزرێتەوە لەخێرەوە بۆ خوارتر یان لەشەڕەوە بۆ خێر.

---

[1] **وەزغە:** جۆرە گیاندارێکی خشۆکە. "فەرهەنگی دەریا: ٢/١٦٠٥."

*دەگونجێت لەهاوسەری ئازیزو لانەو ماڵی دوور بکەوێتەوە، یان دەگونجێت بەسەر دوژمنەکەیدا سەربکەوێت.

*ئەگەر لەیەکێك لەو حاڵانەدابوو شکۆمەندیو خێری دەستگیردەبێتو لەگەڵ ئەوەدا کۆدەبێتەوە کەوا لێی جیابوەتەوە.

*ئەگەر سەر پێچیکاربوو لەشوێنێکدا دوای ئاسانی پەسەنددەکرێو دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر وەستانی حاڵوباری.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چاکبوونەوەی نەخۆشو وەستانی لەبۆچوون بەدووی بەرژەوەندییەکانیدا.

**وەسوەسەکار:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر شەڕو بینینی نهێنیو تێکدانی نێوانی خۆشەویستان.

**وەسوەسەو گوفتاری شەیتان:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر قسەی پڕوپووچ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەقڵدارو تێگەیشتنو جیاکەرەوەی حەق لەناحەق.

**وەقف** ( **ڕاگیرکردن** ): (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەرکرداری چاکە کەلەخوداوەند پێی نزیکدەبێتەوەو پلەوپایەی لەدنیاو قیامەتدا بەرز دەبێتەوە یان لانەو ماڵ یاخود پارە بەڵگەیە لەسەر تەوبەی سەرپێچیکارو ڕێنومایی، دەگونجێت خوداوەند کوڕێکی پێببەخشێ.

*ئەگەر بەرازومەیو زیناکارانی وەقفکرد بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونەوە لەخودا لەشەممەداو زاڵدەبێت بەسەر خەڵکیدا بەزوڵمو زۆرداری.

**وەنەوز( خەوهاتن )** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا دڵنیاییە لەترسو بەڵگەیە لەسەر تەوبەی سەرپێچیکارو ڕێنومایی بێباوەڕ. هەروەها بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی دوای هەژاری، ئەگەر خەڵکی لەناڕەحەتیوگرانیدابوون یا دوژمنداربوون خوداوەند ئەوبارو حاڵە بەرزدەکاتەوە لەسەریانو بەسەر دوژمناندا سەریاندەخات.

**وەنەوشە** : (ئیبن سیرین) دەڵێت: کیژێکی خواناسەو لێکردنەوەی ماچکردنیەتی.

(نابلسی) دەڵێت وەنەوشە ژنێکی جوانە .

*هەروەها وەنەوشەو هاوچەشنەکانی بەڵگەیە لەسەر ژنی کەمئارام یان کوڕی تەمەنکورتو لەش بەبار، ئەگەر وەنەوشە لەگەڵ هەندێك گوڵدا بینی بەڵگەیە لەسەر تەبابیو خۆشەویستی.

## وێ

**وێرانە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی دنیا کاولو وێرانبوە لەکێڵگەو ماڵو خۆشی بەشێوازێکی ڕێكو پێكو بەپۆشاکێکەوە بەدیکرد لەوێڵیو سەرگەردانیدایە.

*ئەگەر بینی دیوارەکانی ماڵەکەی دەڕوخێ بەهۆی ئاوەوە خانەوادەکەی دەمرێت.

*ئەگەر وێرانەیی لەگەڕەکەکەی خۆی بینی وێرانبوە مەرگێك لەو شوێنەدا ڕوودەدات.

*ئەگەر بینی بازدەدات بەسەر ماڵەکەیداو دەڕوخێت مەرگی هاوسەرەکەیەتی.

*ئەگەر بینی ماڵەکەی ڕووخاوە بەسەریداو تەپو تۆز دەکەوێتەوە نەخۆشیو سورێژەیە.

*دەگونجێت ڕمانی سەربان بەلاو نەهامەتی بێت.

*ئەگەر وێرانەو کاولی بینی دیسان ئاوەدانکراوەتەوە چاکیو باشییە لەئاینی خاوەنەکەیداو گەڕانەوەیە لەوێڵیو سەرگەردانی بۆ ڕێنومایی.

*ئەگەر بینی شتێك دەکەوێتە خوارەوە لەماڵەکەی یا کۆشکەکەی یان نێوماڵەکەیو کەسێکی لەسەفەربێت دەگەڕێتەوە بۆ لای یاخود ئەگەر کچی هەبوو دەستنیشاندەکرێت.

*ئەگەر ڕەشەبایەك ماڵێکی ڕووخاند مەرگ لەو شوێنەدا لەسەر دەستی دەسەتەلاتدارێکی ستەمکار دەکەوێتەوە.

(نابلسی)دەڵێت: کاولکاریو وێرانی بەڵگەیە لەسەر پەرتەوازەبوونی خزمو کەسوکارو مەرگیان.

*وێرانبوونی شار بەڵگەیە لەسەر مەرگی خاوەنەکەی یاخود تاریکاییە.

*مەرگی پادشا بەڵگەیە لەسەر وێرانبوونی شار.

*ئەگەر خۆی لەوێرانەیەکدا بینیەوە کەبەهۆی زەمین لەرزە یاخود شتێکیترەوە وێران بوبێت بڕیار بەسەر یەکێکدا دەدرێت بەمردن یان شکۆمەندی خانەوادەو کەسی ڕێزدار کەمدەکاتەوە.

*ئەگەر خۆی لەنێو وێرانەیەکدا بینیەوە لەگەڵ نەتەوەیەکدا تێهەڵدەچێت توانای بەربەرەکانی نییە لەگەڵیاندا.

*ئەگەر شارێك بەهۆی زەمین لەرزەوە وێران ببێ بڕیاری کوشتن بەسەر یەکێکدا دەدرێت.

*ئەگەر بینی لانەو ماڵێکی دێرین‌و کۆن دەڕمێنێ غەم‌و پەژارە رووی تێدەکات.
*ئەگەر بینی ماڵەکەی دەڕمێت بەسەریا یاخود هەندێکیدەڕمێت مرۆڤێک دەمرێت لەنێویدا یان خاوەنەکەی بەڵاو نەهامەتیەکی گەورە رووی تێدەکات یارووداوێکی دڵتەزێن.
*ئەگەر ژنێك سەرماڵەکەی بینی رووخا مێردەکەی دەمرێت.
*ئەگەر شوێنێکی ئاوەدان ببینێ وێرانبوە یان دەڕمێت بەڵاو نەهامەتی لەو شوێنەدا دەکەوێتەوە.
*ئەگەر کۆڵەکەو پایەی ماڵەکەی رما یان درزی تێبوو دەمرێت یان هەندێك کەس‌وکاری ئازیزی دەمرن، هەروەها هەموو شکان‌و رووخانێك لەماڵ‌و دیواردا بەڵاو نەهامەتییە.
*ئەگەر فەرمانڕەوایەك بینی ماڵەکەی رماوە لابردن‌و دوورخستنەوەیەتی لەدەستەڵات.
**وێڵی‌و سەرگەردانی:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر فیتنە لەئایندا‌و لادان لەڕێنومایی‌و دەرخستنی حەق‌و راستی.
**وێنەگر:** (نابلسی)دەڵێت: وێنەگر لەخەودا کەسێکی درۆزنە بەدەم پەروەردگارەوەو خاوەن بیدعەیە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شاعیرو گۆرانیبێژو هاوچەشنەکانی لەوانەی ماڵ‌و سامان بەهۆی کاری پووچەوە وەردەگرن.
(نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:
+زانیاری.
+ئەندازە.
+دانایی.
+هۆنراوەدانان.
+غەزەل.
+درۆ.
+هەڵبەستنی درۆ.
+خۆهاویشتنە نێو کاروبارە مەترسیدارەکان.
+دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر :
+خراپە.
+مەیخواردنەوە.
+هاوسەر.
+منداڵ.
+ستەمکار.
+ئەوانەی بەدەنگە دەنگ‌و قسە دەژین.
*وێنەگر خاوەن شتی پڕوپووچەو کاروباری خەڵکی دەڕازێنێتەوە.

# هـ



**ها**

**هابیل:** (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی ئیرەیی پێدەبات و زیانی لەدوژمنێکەوە پێدەگات، دەگونجێت بەبێتاوان بکوژرێ یان ستەمکارێك زوڵم و ستەمی لێبکات.

*ئەگەر (هابیل)ی بینی لەخەودا گوێڕایەڵی خوداوەند دەکات و ناڕەحەتی و لاوازی بەهۆی ژن یان خزمەکانیەوە لەسەر رازیکردنی خوداوەند پێیدەگات و پەروەردگار دەیخاتە بەهەشتەوە.

**هاتن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بۆ پیاوان ژمێردراوی پەروەردگارە بۆ خەڵکی ناڕاست راسته‌ رەوەیە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دەموزاری خاوەنەکەی و خزمەتکارو کۆیلەی. هەروەها دەڵێن: پیاوێکە ماڵ و سامان بەکێشدەکات بەلای خۆیدا، هەروەها دەڵێن: ژنێکی زماندرێژە.

(نابلسی) دەڵێت: دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر بژێوی و رزق و رۆزی و سوودو قازانج لەکوڕوژنەوە.

*زۆرجاریش هاتن گەشبینییە بەناوەکەیەوە.

(نابلسی) دەڵێت: گەڕانەوەی کەسێکی ئاوارە لەسەفەر دەرولێکردنەوەیە دوای ناڕەحەتی و لەشساغییە پاش نەخۆش گەڕانەوەی مرۆڤە لەوەی لەسەریبوە.

*ئەگەر خەوبینەر غەم و پەژارە دایگرت بەگەڕانەوە غەریب و ئاوارە بەڵگەیە لەسەر داوا یان کەوتنە نێو ئەوەی ترسی هەیە بەرانبەری.

**هاتن و چوون لەنێوان (صەفا)و (مەروە)دا:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگیە لەسەر چاکی نێوان ، ئەگەر جامبازبوو دادپەروەردەبێ لەگوتەی خۆی یان لەنێوان دوو هاوسەرو منداڵەکانیدا، ئەگەر خەوبینەر نەخۆشبوو

چاكدەبێتەوەو هەوڵدەدات بژێوی پەیدا بكات.

**هاتنەخوارەوە:** (نابلسی)دەڵێت: كەوتنەخوارەوە لەخەودا لەسەرەوە بۆ خوارەوە جیابوونەوەیە لەپلەوپایەو هاوسەرو بۆچوون.

*ئەگەر بینی لەبەرزارییەك هاتە خوارەوە یان لەسواری ئوتومبیل‌و ولاخێك یاخود چوە نێو گۆڕێك كارو بارەكانی لێقورس‌وگراندەبێ كەخۆی بۆ ئامادەكردوە.

**هاتنی دەجال:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر كەسێكی تێكچووی هەڵخەڵەتاو بانگەشەدەكات بۆ بیدعەو بەدەردەكەوێت لەنێو خەڵكیدا.

**هاروون(سەلامی خوای لێبێت):** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بەدیكرد پۆستێكە بەدەستیدەهێنێت دوای گێرمەو كێشمەو دەرەنجامی كاریش بۆ ئەو دەبێ.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر (هاروون)ی بینی بوە بەئیمام‌و پێداویستی داربێت بەدەستیدەهێنێت.

*ئەگەر (موسی)و (هاروون)ی(سەلامی خوایان لێبێت)بینی لەسەردەستی ئەودا ستەمكارێك لەناودەبات.

*ئەگەر یەكێكیان یان هەردووكیانی بینی‌و خوازی شەڕو جەنگبوو سەركەوتن بەدەستدەهێنێ.

**هاڕین:** (نابلسی)دەڵێت: هاڕین‌و تێكشكانی لەخەودا هەوڵدان‌و فرێدانی قسەیەكە سوودو قازانجی تێدابێت.

**هاندان:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: هاندانی مرۆڤ بۆ كەسانیتر لەخەودا لەسەر تێركردنی هەژاران یاخود چاكە ئەنجامدان یاخود تەوبەیە بۆ كەسی بەدو خراپ‌و خۆتەرخانكردنە بۆ پەیڕەویكردنی پێغەمبەر(ﷺ).

**هاندانی مرۆڤ بۆ خەڵكی لەسەركاركردن:** (نابلسی)دەڵێت: بەڵگەیەلەسەر پەسەندكردنی ئامۆژگاری‌و مۆچیاری، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مردن‌و هۆكارەكانی.

**هاواری مرۆڤ:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی هاواردەكات بەسەر كۆمەڵێكدا دەستەلات‌و توانا بەدەستدەهێنێت چونكە هاواركردن (صیحة) لەزمانی عەرەبدا دەوڵەتە.

*ئەگەر بەتەنیا هاواریكرد هێزو دەستەلاتی لاوازوكز دەبێ.

*هاواركردن بەڵگەیە لەسەر فیتنەو ئاشوب بەهۆی روودانی بەلاو نەهامەتی لەكوشتارو رمان‌و نوقمبوون‌و رووداوێكەوە یان نەخۆشیەوە خەڵكی هاواری خوداوەندی پەروەردگاریدەكات.

**هاوتا:** بینینی بەڵگەیە لەسەر سەفەرو جموجووڵ. ئەوەی باشبێ سەفەرە.

**هاوسەرانی پێغەمبەر(ﷺ):** (نابلسی) دەڵێت: بینینیان لەخەودا نیشانەی دایکایەتیە یان بەڵگەیە لەسەر خێرو فەرو بەرەکەتو منداڵ کەزۆرینەیان کچن.

*دەگونجێت بینینیان نیشانەی نەبوونیو گۆڕانی سوێند بەهۆی دەرخستنی نهێنی یان شاردنەوەو تاوانبارکردن.

*ئەگەر ژنێك خاتوو(عائشە)ی بینی (رەزای خوای لێبێت) لەخەودا پلەوپایەیەکی بەرزی دەستگیردەبێت لەگەڵ ناویانگێکی باشو بەختو شانس لەلای ماڵە باوانو مێردەکەی.

*ئەگەر خاتوو (حەفسە)ی بینی(رەزای خوای لێبێت) نیشانەیەکی خراپە.

*ئەگەر خاتوو(خەدیجە)ی بینی (رەزای خوای لێبێت) لەدەستدانی مێردو باوكو دایکە.

*بینینی (فاتمە)ی کچی پێغەمبەر (ﷺ) نیشانەی لەدەستدانی مێردوو باوكو دایکە.

*بینینی (حەسەن)و (حسێن) (رەزای خوایان لێبێت) نیشانەی فیتنەو شایەتیدانە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زۆری هاوسەرو منداڵو گەڕانو سەفەرو ئاوارەبوون، بەڵام ئەوەی خەویان پێوە دەبینێت بەشەهیدی دەمرێت بەدەرمان خواردکردن یان کوشتن یاخود دووری لەنیشتمانەوە.

*ئەو پیاوەی یەکێك لەهاوسەرانی پێغەمبەر ببینێ(ﷺ)و خۆی رەبەن بێت ژنێکی چاكو باشدەهێنێت.

*هەروەها ئەگەر ژنێك هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) ببینێت نیشانەی کارێکی چاکەدەڕژێت بەسەریاو رووی تێدەکات.

**هاوسەرگیری:** (نابلسی) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر چاودێری پەروەردگار.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر قەرزو غەمو پەژارە دەستەبەرکردن، یاخود هەوڵدان بۆ گرتنەدەستی پۆستی دەستەلات.

*ئەگەر ژنێکی ناسراویکرد بەهاوسەری خۆی هەوڵدەدات لەکارێکدا کەدەتوانێ ئەنجامیبدات.

*ئەگەر ژنێکی نادیاری هێنا یاخود لەخەودا ژنی نەبینی بەڵگەیە لەسەر نزیکی مەرگو دنیا بەجێهێشتن یاخود گەشتوگوزارو سەفەر لەلانەوماڵێکەوە بۆ لانەو ماڵێکیتر، ئەگەر شایستەی

پۆستی دەستەڵاتبوو بەدەستیدەهێنێت.
*ئەگەر هاوسەرگیرییەکەی بەبەڵێنامەبوو پەیمان و بەڵێنیی باشە لەگەڵ پەروەردگار، ئەگەر بەشاییو ئاهەنگێرانبوو پلەوپایەو ناوبانگی باشەو بەرزو بالآدەبێت پێی.
*هاوسەرگیری بەپیشە لێکدەدرێتەوە، ئەگەر بینی ژنێکی هێناو ژنەکەیمرد پیشەوکارێکی دەبێت بەتەنیا ماندوبوونو شەکەتیو غەمو پەژارەی لێدەستدەکەوێ.
*ئەگەر لەخەودا چوار ژنی هێنا زیادە بەدەستدەهێنێت.
*ئەگەر بینی ژنێکی جولەکەی هێنا هەوڵدەدات لەپیشەکەیداوگوناهو تاوانی دەستگیردەبێت.
*ئەگەر بینی ژنێکی مەسیحی هێنا لەپیشەکەیدا هەوڵدەدات مایەپووچ دەردەچێت.
*ئەگەر بینی ژنێکی ئاگرپەرستی هێنا پیشەیە فێردەبێت بەدەر لەئاینداریی.
*ئەگەر ژنێکی زیناکارو داوێنپیسی هێنا خۆی زیناکارو داوێنپیسە.
*ئەگەر ژنێکی دەمو زوباندرێژی هێنا کۆتو بەندێکی قورس دەکرێتەوە گەردنو ئەستۆی.

*ئەوەی سەگێك بکات بەهاوسەری خۆی دەبێت بەخاوەنی کارێکی نادیارو ناشیاو.
*ئەگەر بینی کچی فەرمانڕەواو دەستەڵاتداری هێناو گۆرانیو مۆسیقا لێدرا ئارەقدەخواتەوە یان ئەوەی کاری ئارەقی پێئەنجامدەدات.
*ئەگەر بینی مرۆڤێك ژنێکی هێناو گواستیانەوە بۆی ماڵو دارایی لەمێردی ژنێك بەدەستدەکەوێ، ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ ئەنجامدا مێردی یەکەمی ئەو ژنە ماڵو داراییو خێری دەستگیردەبێت لەوپیاوە.
*ئەگەر بینی هاوسەرەکەی شوویکردوە بەپیاوێکی تادار تووشی لەرزو تا دەبێت.
*ئەگەر ژنی دەستەڵاتداری هێنا موڵكو دەستەڵاتی دەستگیردەبێت، ئەگەر شایستەی ئەوکارەبێت.
*ئەگەر لەگەڵ ژنێکی مردوودا هاوسەرگیری ئەنجامدا زەفەر بەکارێکی بێبەرهەمو مردوو دەبات کەناهومێدبوە لێی.
*ئەگەر ژنێکی نەخۆش شوویکردو مێردەکەی دیارینەکراو نەیناسی دەمرێت، هەروەها پیاوی نەخۆشیش بەوچەشنەیە.

*ئەگەر دایکی دابەشوو زەوی‌و موڵك دەفرۆشێ، ئەگەر خەوبینەر دووگیانبوو کچیدەبێت، ئەگەر دەرکەوت وەك کوڕیدەبێت.
*ئەگەر ژنێکی کوڕداری بینی شوودەکات پاشان ژن بۆ کوڕەکەی دەهێنێت.
*ئەگەر ژنی رەبەن شوویکرد یان مێردار خێری دەستیگردەبێت.
*ئەگەر ژنێك بینی شوودەکات بەپیاوێکی مردوو یەکێتی نێو ماڵی پەرت پەرت دەبێت‌و هەژار دەکەوێت.
*ئەگەر بینی ژنێکدەکات بەهاوسەری خۆی‌و دەچێتە لای ئەوە پەی بەکاروباری مردوویەك دەبات‌و بۆی زیندوو دەکاتەوە.
*ئەگەر نەچوە لای ئەوە پەیبردن بەوکارە وەك ئەوەیە چووبێتە لای.
*ئەگەر بینی ژنێکیکردوە بەهاوسەری خۆی یاخود چەند هاوسەرێکی هەیە خێرو دەستەڵات‌و پلەوپایەی بەئەندازەی جوانی ژنەکە دەستگیر دەبێت ئەگەر دەستنیشانیکرد یاخود ناسی، ئەگەر نەیناسی‌و دیاری‌و ناوزەدنەکرا بۆی بەڵگەیە لەسەر مەرگی یان مەرگی مرۆڤێك لەسەر دەستی ئەو.

*ئەگەر بینی کچی شێخێکی نەناسراوی کرد بەهاوسەری خێرێکی زۆری دەستگیردەبێت، ئەگەر ژنێك بینی شویکردوە بەشێخێکی نادیار ئەوە خێرێکی گەورەی دەستگیردەبێت، ئەگەر نەخۆشبوو لەنەخۆشیەکەی چاکدەبێتەوە.
*ئەگەر بینی ژنێکی مردوویکرد بەهاوسەری خۆی لەوانەی بۆیناشێت پەیوەندی سۆزو رەحمی بەجێدەگەیەنێ، ئەگەر زیندوبوو پەیوەندی خزمایەتی دەبچڕێ.
*ئەگەر ژنێکی مەحرەمی خۆیهێنا کاروباری خانەوادەکەی دەبات بەڕێوە.
*ژن لەخەودا:
+هاوبەش‌و شەریکە.
+دوژمنە.
+دەستەڵاتدارێکی ستەمکارە یاخود نەیارێکی سەرسەختە.
+پادشایە.
+کەشتی‌و ئامرازی گواستنەوەیە.
+هەموو شتێك زەوی بەڵگەبێت لەسەری وەك پشوو ماندوبوون‌و خێرو خراپە.
**هاوەڵایەتی**: (نابلسی)دەڵێت: ئەگەر نەخۆشێك بینی لەخەودا هاوەڵایەتی

کەسێکیتر دەکات بەڵگەی چاکبوونەوەیەتی.

*ئەگەربینی هاوەڵایەتی خانەوادەکەی دەکات بەڵگەیەکی خراپە، ئەگەر هاورێیەکی سەیرو نامۆبوو کردارێکە زیانی پێدەگەیەنێ.

**هاوین**: (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زیندووکردنەوەی سوننەتو هاوسەرداریو منداڵخستنەوەی باش.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەردەرکەوتنی بەڵگەو قوتاربوونی زیندانیانو گەڕانەوەی ئاوارە.

## هـو

**هود( سەلامی خوای لێبێت )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر (هود)ی بینی دوژمنانی قسەی نابەجێدەکەن بەرانبەریو زاڵبوون بەسەریاو ستەمی لێدەکەن بەڵام دواتر سەردەکەوێت بەسەریاندا ، بەهەمان شێوە ئەگەر (صالح)یشی بینی.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی کۆمەڵێکی نەزان زاڵدەبن بەسەر پاشان زاڵدەبێت بەسەریانداو لەناڕەحەتی مەزن قوتاردەبن بەپێی ئایەتی: ﴿وَنَجَّيْنَاهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ (هود: ٥٨).

*ئەگەر (هود)ی بینی ڕێنومایی و خێری دەستگیردەبێتو کۆمەڵێك لەسەردەستی ئەودا قوتار دەبن.

**هونەر**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هونەری جیاواز جیاواز بەپێی خاوەنەکانیو بەڵگەیە لەسەر چاکبوونەوە لەنەخۆشیو دڵنیایی لەترسو بیمو دڵخۆشی دوای بێزاریو ناڕەحەتی.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر شوێنی هاوینەهەوار یاخود بینینی ڕەنگی جۆراوجۆر یان جلوبەرگو ڕووخساری جوانو قەشەنگ.

## هـۆ

**هـۆڕ**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی ویستوخواز.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مانای ناسکی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانیاریو ماڵو دارایی زۆر.

**هـۆڵ**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر:

+پشوودان.

+ڕەواندنەوەی هەژاریو نەداری.

+ژنێکی کەم ئەرکی پشتوپەنا.

+پلەوپایەیەکی بەرزو کەم مەترسیدار.

+ئالاو هێمایەکی سەرەڕێ بۆ ئەوەی لەسەفەردایە تا سەلامەتبێ.
+کوڕێکی چاك و خزمەتکارێکی هاوتاوماڵێکی بەسوودو قازانج.
*ئەگەر تاریکبوو خشۆکی دڕندەو چەندین زیندەوەری بەزیانی تێدابوو سەرجەم لێکدانەوەکان ئاوەژوو دەبنەوە.
**هۆنراوەبێژی**: (نابلسی)دەڵێت ئەوەی لەخەودا هۆنراوەیەك یان دێڕە هۆنراوەیەك لەبەر بکات زانیاریو رزق و رۆزیو بەخششی باشی لەپیشەکەیدا بەدەستدەهێنێت.

## هە

**هەتیوویی**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی هەتیووکەوتوە کەسانیتر لەباسی ژن و پارەو بازرگانیدا شکستدەهێنن.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی هەتیوکەوتوە زاڵدەبن بەسەریا.
**هەردوو باڵ (باسك ـ هەردوودەست)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەردووباڵ لەلێکدانەوەدا دووکەسی نزیکە یان دوو هاوڕێیە وەك براو کوڕی باڵغەو سوودی لێوەردەگریو پشتی پێدەبەستێ.
*ئەگەر پیاوێك ژنێکی باڵڕووتی بینی دنیایە بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لەشەوی (معراج)دا: "ئەوەی ببینیێ دوو قاچی ئاسنی هەیە کورو هێزە لەسەفەردا".
*هەروەها (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر کەسێکی باڵکورتی بینی بەڵگەیە لەسەر ئازایەتیو دەستودڵفراوانیو سەرسامی.
**هەرزن**: (نابلسی) دەڵێت:ماڵو سامانێکە تێکەڵ بەماڵو سامانیتر دەبێت، هەروەها سەرجەم دانەوێڵەکانی تریش بەو چەشنەن.
*هەروەها دەڵێن: هەرزن بەڵگەیە لەسەر هەژاریو تیاچوونی ماڵو دارایی، بۆ یەکێکیش بژێوی لەگەڵ ئاگردابێت چوستو چالاکیو گورجو گۆڵییە.
**هەرسکردنی خواردن**: ئەگەر بینی لەخەودا خواردنەکەی هەرسبوە هەوڵدەدات لەپیشەکەیدا. هەرسکردن بەڵگەی دڵنیاییە لەترسو بیم بەپێی ئایەتی: ﴿ وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴾ (طه: ١١٢).
*هەرسکردنی خواردن بەڵگەیە لەسەر چوستو چالاکی لەسەرجەم کاروبارەکاندا.

**هەرمێ**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: زوربەی ڕاڤەکارانی خەو بەباشی دانانێن‌و دەڵێن: نەخۆشییە، هەندێکدەڵێن: ماڵ‌و سامانێکە یەکێك پەیداییکردبێ‌و خواردبێتی چونکە ناوەکەی بەڵگەیە لەسەر ماڵ‌و سامان.

*هەروەها دەڵێن: زەردەکەی ماڵە لەگەڵ خۆشحاڵبوون.

*دارەکەی پیاوێکی عەجەمییە چاودێری خانەوادەکەی دەکات‌و تاماڵی لێپەیدا بکات.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر ژن بینی بوە بەخاوەنی هەرمێ کورێکیدەبێ.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی هەرمێیەکی زۆر بەدەستدەهێنێ ماڵ‌و سامانێکی جەمکراوی دەستگیردەبێ.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵ‌و سامانێکە پێیدەگات بۆ یەکێك بیخوات بەدەستیدەهێنێ.

*هەرمێ بەڵگەی خێرە چونکە چەند ڕۆژێ دەمێنێتەوەو خراپ نابێ، خواردنیشی لەڕۆژانی خۆیدا باشترە لەوەی لەکات‌و وەرزی خۆیدانەبێ چونکە لەوەرزی خۆیدا نەبێت ماڵ‌و سامانێکی حەرامە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مەرگی نەخۆش‌و ئەسپەردەکردنی‌و گەرلەکاتی خۆیدا نەبوو نەخۆشیە.

**هەریسە**[1] : (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا غەم‌و پەژارەیە یاخود لێدانە لەلایەن کار پێسپێراواندا.

*ئەگەر بینی هەریسە دروستدەکات لەشوێنێکداو نەخۆشی تێدا هەبوو ترسی مردنی هەیە.

*هەروەها ئەگەر کۆمەڵێ سەربازی بینی هەریسە لەخۆی یان کەڵلەی سووروەوکراو جەنگ بەرپادەبێ لەنێوانیانداو کۆمەڵێك سەرکردە لەناو دەچن.

**هەرێز( پەڵك )**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: دەگێرنەوە پیاوێك لەخەودا دەبینێ پەڵك لەئەژنۆی ڕواوەو خەونەکەی بۆ ڕاڤەکارێکی خەودەگێرێتەوە ئەویش دەڵێت: بۆ تۆو شەریکەکانت خێرو بەرەکەتەو بۆنەخۆش مردنیەتی ، ئنجا هەموو ئەو حاڵانە هات بەسەر ئەوپیاوەدا کەخەونەکەی بینیبوو.

**هەڕەشەلێکردن**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: هەڕەشەلێکردن بۆ هەڕەشەلێکراو هێمنی‌و ئاسایشە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی لەلایەن یەکێکیترەوە هەڕەشەی لێدەکرێ‌و دەیانەوێت ملکەچی بکەن‌و زاڵدەبێت‌و ناترسێت‌و ملکەچیش نابێت.

---

[1] **هەریسە**: خواردنێکە لەگەنمی کوتاوو گۆشت دروستدەکرێ. (فەرهەنگی دەریا: ٢/١٥٤٣).

*هەڕەشەکردنیش لەخەودا بەڵگەیە لەسەر دەستبەرداربوون لەناکۆکی، ئەگەر نادیابوو نەیزانی لەشەیتانەوەیە ئەگەر هەڕەشەی لێکرد لەسەر نوێژ یان قورئان خوێندن و زەکاتدان و هاوچەشنی ئەوە بەندایەتیانە، دەگونجێت هەڕەشە لێکردن لەخەودا بەڵگەبێت لەسەر تاقیکردنەوە بەخۆشەویستی و ئەوین.

**هەژاری:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر بینی هەژارە خواردنێکی زۆر بەدەستدەهێنێت بەپێی چیرۆکی (موسا)و قورئان دەفەرموێ: ﴿ رَبِّ انِي لِمَا انْزَلْتَ الَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴾ (القصص: ٢٤).

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی هەژارە پرسیار لەخەڵکی دەکات و دوعاش زۆردەکات چونکە هەژاران دوعاگۆی هەمیشەیین.

*هەروەها هەژاران لەشوێنێکدا بەڵگەیە لەسەر مەرگی دەوڵەمەندو خێرێکە بەدەر دەکرێ.

*ئەگەر هەژاری لەخەودا پێدرا ماڵ و سامانێك بەبێماندوبوون و پارەیەکی بێسەرمایە دەستگیردەبێ و ماڵ و سامان وەردەگرێ.

*ئەگەر بینی هەژارکەوتوە خێری دەستگیردەبێ.

**هەژاری و نەداری:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا هەژاری و داوا لەخەڵکیکردن بەڵگەیە لەسەر وەڵامدانەوەی دوعا بۆ ئەوەی داواخوازیەتی.

**هەسارەو ئەستێرە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەستێرەکان بەڵگەن لەسەر زانایانی نێو خەڵکی، نێرەکان پیاون و مێیەکان ژنن، مەزنەکانیش خەڵکی رێزدارە، بچووکەکانیش خەڵکی گشتی و منداڵ و بەردەستن.

*ئەستێرەی رێنیشاندەر یارانی پێغەمبەرانی(ﷺ) لەگەڵ زاناو خواناسان بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) : "یارانم وەك ئەستێرەن".

*ئەگەر خەوبینەر دەستەڵاتداربوو ئەستێرەکان سەربازن، ئەگەر زاوابوو ئەستێرە پیاوەکانیەتی، ئەگەر بووکیشبوو ژنانە لەدەوری.

*ئەگەر دوومانگی بینی لەئاسماندا شەڕیانە لەگەڵ هەر یەکێکیاندا ئەستێرەهەبوو جیاوازی و جەنگە لەنێوان دوو وەزیرو سەرکردەو دووپیاوی گەورەدا روودەدات. ئەوەی دیار نامێنێ دەبەزێ.

* ئەگـەر دوو هەسـارەی بینـی دەجـەنگان و ئەسـتێرەیان لەگەڵدابوو بەهـەمان شـێوەیە، بـەڵام ئەگـەر ئەسـتێرەیان لەگەڵدانـەبوو ئـەوەی لـەماڵی خۆیدا بینـی و دووهاوسـەر یان دوو شـەریکی هـەبوو جیـاوازی لەنێوانیاندا بەدەستو زوباندەبێ.

* ئەگەر ژنێك خـەوێکی لـەو چەشـنەی بینـی کەوادەجـەنگن بەسـەر سـەریەوە یـاخود بەوچەشـنە کەوتنـەخوارەوە گـەورەو بەرپرسـی لەگـەڵ مێردەکـەی شەڕ دەکەن.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسـەر کڕیارو فرۆشـی، دەگونجێـت بـۆ ئـافرەت بەڵگەبێت لەسـەر شـەڕێك لـەنێوان دوو کوڕیـدا روویـدات یـان دوو کـچی یـاخود لەنێوان باوكو هاوسەرەکی یان لەنێوان مێردو کوڕەکەیدا.

* کەوتنـەخوارەوەی ئەسـتێرە بۆسـەرزەوی یـان کەوتنـەنێو دەریـا یـاخود سـووتانی بـەئاگر یـان گواستنەوەی لەلایەن باڵندەوە بەڵگەیە لەسەر رووداني مردن لـەنێوان خـەڵکی یـاخود مردنـە بـەپێی زۆروکـەمی و دەگونجێت لەناو پیاوان یان هەر ژناندا روویدات ئەگەر ئەو جۆرە هەسارەیەی ناسی کەوا کەوتە خوارەوە.

* ئەگـەر لەژوورەکەیدا بـوو بـەخاوەنی ئەستێرەو لەئاسماندا چاودێریکرد یان لەهەوادا ئەگەر شایستەی دەستەڵاتبوو بەدەسـتیدەهێنێت، ئـەوجا دەبێـت بەقازی و موفتی بەسەر خەڵکەوە ئەگەر نزمتربوو دەگونجێت تەماشای زانیـاری ئەستێرە بکات.

* کەوتنـەخوارەوەی بەسـەریدا لـەکاتی نەخۆشیا مردنیـەتی، ئەگـەر قـەرزاربوو داوای لێدەکرێتـەوە، هـەروەها ئەگـەر بینی لەش و لاریبوە بەئەستێرە یاخود سـەری ئەسـتێرەی پێـوە دەرکـەوت دەگات پێی.

* ئەگـەر ئەسـتێرەکەوت بەسـەریا کەسێکی نادیار دێتەوە بۆ لای، ئەگـەر کەوت بەسەر ژنێکی دووگیاندا کـوڕێکی ناوداری بەرێزیدەبێ.

* هەروەها دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر مەرگی دووگیان ئەگەر شاهیدێك ئەوەی دووپـاتکردەوە گەواهیـدەربێ لەسـەر مردن.

* بینینـی ئەسـتێرە بـەرۆژ بەڵگەیـە لەسـەر شـوورەیی و ناوبـانگ و رووداوی گـەورەو بەلاونەهامـەتی بـەپێی حـاڵی گشتی خەون و تایبەتی.

* ئەگـەر ئەسـتێرەی بینـی لەماڵەکەیدا کۆبوەتـەوەو رووناکیـداوە خۆشـی و

شادی رووی تێدەکاتو خەڵکی ڕێزدار لەلای کۆدەبێتەوە، ئەگەر نوری نەبێ بەلاَو نەهامەتیەو خەڵکی ڕێزدار کۆدەبنەوە تیایدا، ئەگەر بینی پەیوەندیدەکات بەئەستێرەوە لەسەر نەتەوەی پێغەمبەرە(ﷺ).

*ئەگەر بینی ئەستێرەیەك دەدزێ دەبێ بەخاوەنی شتێ مەترسیدارەو کەسێکی ڕێزدار لەکیسدەدات.

*ئەگەر بینی بوە بەئەستێرە ڕێزو پلەوپایە بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر بینی هەسارەیەکیبرد خوداوەند کوڕێکی ڕێزداری گەورەی پێدەبەخشێ.

*ئەگەر بینی دەستی بەرزکردەوە روو بەئاسمانو ئەستێرەی برد دەستەلاَتو ڕێزی دەستگیردەبێ.

*ئەگەر (سوهەیل)دەرکەوت لیی ئەوە پشتتێکردن هەتا دوایی تەمەنی رووی تێدەکات.

*ئەگەر (زەهرە) دەرکەوت ئەوە بەختی باش رووی تێدەکات، هەروەها (موشتەری) بەهەمان شێوەیە.

*ئەگەر سواری هەسارەیەکبوو دەستەلاَتو پلەوپایەو خێروسوودو قازانجی دەستگیربوە.

*هەندێکدەڵێن:ئەگەر بینی هەسارە لەئاسماندا نەماماڵو سامانی دەڕوات، ئەگەر دەوڵەمەندبێت بەلاَم ئەگەر هەژاربوو دەمرێ.

*ئەگەر هەسارەی بچووك بچووکی بەدەستییەوە بینی باسو ناوبانگی باش پەیدادەکات لەنێو خەڵکیدا.

*ئەگەر ئەستێرەی لەسەر جێگەکەی بینی ناوبانگ دەردەکاتو زاڵدەبێ بەسەر هاودەمەکانی یاخود خزمەتی پیاوێکی ڕێزداردەکات.

*ئەگەر هەسارەی بینی کۆبوەتەوەو تیشكو روونـاکی بلاَوکردوەتەوە بەلگەیە لەسەر ئەوەی خێری لەسەفەرەوە دەستگیردەبێ، ئەگەر لەسەفەردابوو بەدڵێکی خۆشەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای هاوسەرەکەی.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر هەسارەی لەژێر سەربانێکدا بینی بەلگەیەکی خراپە، هەروەها بەلگەیە لەسەر وێرانبوونی ماڵی خەوبینەر، هەروەها بەلگەیە لەسەر مەرگی خاوەن ماڵ.

*ئەگەر بینی ئەستێرە دەخوات ماڵی خەڵکیدەخوات.

*ئەگەر ئەستێرەی قووتدا بەبێخواردن تێکەڵدەبێ لەگەڵ خەڵکی ڕێزداریدا لەکاروبارو نهێنیدا، دەگونجێت پلارو

تـوانج لـەیارانبگرێ (دروودی خوایـان لەسەربێت).

*ئەگەر ئەستێرەی مژی لەزانایانەوە زانیاری فێردەبێت.

*سـەبارەت بـە(پێـنج)هەسـارە گەڕۆکەکە:

١)(زوحـەل) خـاوەنی سـزای فەرمانڕەوایە.

٢)(موشتەری) خاوەن ماڵە.

٣)(مـەریخ)خـاوەن جـەنگی فەرمانڕەوایە.

٤)(زەهرە)هاوسەری فەرمانڕەوایە.

٥)(عەتارد) نووسەری فەرمانڕەوایە.

*هـەروەها ئەگـەر بینـی ئەسـتێرەکان لـەئاسمان کەوتنـەخوارەوە مـەرگی فـەرمانڕەوا یـان جـەنگێك کۆمەڵـە سەربازێك لەناو دەچن تێیدا.

*ئەگەر بینـی گـەردوون دەسوورێتەوە یـان دەجـووڵێ سـەفەردەکاتو لەپلەوپایەکـەوە دەچـێت بـۆ پلەوپایەیەکیترو حاڵوباری دەگۆڕێ.

*ئەگەر بوو بەئەستێرەو ڕێنوماییکرد خـەڵکی پێویـستیان پێـی دەبـێ لەکاروبارەکانیانو راوبۆچوونیدا.

(نابلـسی) دەڵێـت: ئەگـەر (حـەوت) هەسـارە گەڕۆکـەی بینـی بەڵگەیـە لەسـەر پیـشەسازیو بازرگـانیو زانیاریو دەستەڵات، بۆ هەرکەسێکیش بەپێی ئەندازەی خۆیو بەختی.

*ئەگـەر بینـی ئەسـتێرە لەئاسمانـدا نـەماوە ماڵیـدەڕوات ئەگـەر دەوڵەمەنـدبێت، ئەگـەر هـەژاربوو دەمرێ.

*ئەگەر بینی ئەستێرەی مەزن تیشكو روونـاکی بڵاوکردوەتـەوە خێروچـاکەو دەستەڵاتو زانینی دەستگیردەبێ.

*ئەگـەر هەسـارەیەکی مـەزنی بینـی کەوتـەخوارەوەو لەشـوێنی خـۆی بەرپرسێك لەوشارەدا دەمرێ.

*ئەگـەر بینـی هەسـارەی بـچووك بەدەسـتی دەگـرێ خێـرو دەسـتەڵاتی لەنێوان خەڵکیدا دەستگیردەبێ.

*ئەگەر هەسارەی بەسەری خۆیـەوە بینـی ناوبانگـدەردەکاتو پـێش هاوچەشـنەکانی دەکـەوێت بـەوەی خزمەتی پیاوێکی بەڕێز دەکات.

*ئەگـەر بینـی هـەموو ئەسـتێرەکان کۆبوونەتـەوە رووناکیـان پەخشکردوە لـەدوای سـەفەرەوە خێـری پێدەگات، ئەگەر لەسـەفەردابوو بەخۆشحاڵییەوە دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی.

*ئەگەر هەسارەیەکی بینی دەستەڵات بەدەسـتدەهێنێت لەگـەڵ هێزو توانـاو سوودو قازانج.

*ئەگـەر ئەستێرەكانی لـەژێر سـەربانێكدا بینیـەوە بەڵگەیـە لەسـەر وێرانبوونی ماڵەكەی هەتا رووناكیەكەی لەنێوماڵەكەیدا بێـت یـاخود بەڵگەیـە لەسەر مەرگی خاوەن ماڵ.

*ئەگەر بینـی هەسارە دەخـوات مـاڵی خەڵكیدەخوات.

*ئەگەر هەسارەكانی قووتـدا خـەڵكی شـكۆمەند خۆیـان دەهاوێژنـە نێوكاروبارەكـانی‌و نهێنییـەوە، دەگونجێت بەدگۆیی بەرانبەر یارانبكات (خوایان لێڕازیبێت).

*ئەگەر هەسارەی مـژی فێری زانیـاری دەبێ لەزانایانەوە.

*ئەگەر بینـی هەسارەكان دەخـوات‌و رمـڵ لێـدەرە یـاخود تەماشـای كـاری ئاسمانیانـدەكات لەگـەڵ زانیـاری گەردووناسی ئەمـەش بەڵگەیە لەسـەر كارێكی گەورەو باشـی حـاڵ‌و گوزەران بۆ سەرجەم خـەڵكیش بەڵگەیـە لەسـەر مەرگ.

*ئەگەر بینـی ئەستێرەكان هـەڵوەرین مـەرگی فـەرمانڕەوایانی گەورەیـە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر جەنگ.

*ئەگـەر بینـی ئەستێرەكان دەكـەون بەسـەر زەویـدا لەئاسمانـەوەو بـڵاو دەبونەوەودیارنەدەمان بەڵگەیە لەسـەر تیاچوونی گەل‌و نەتەوەیەكی زۆر.

*هەسـارەو ئەسـتێرە گـەورەكان بەڵگەیـە لەسـەر مردنـی گـەورەو فـەرمانڕەواو پیـاوانی خانـەدان. هەسـارەو ئەسـتێرەی بـچووكیش بەڵگەیە لەسەر مەرگی نادیارو بچووك‌و زەبوونەكان.

*ئەگـەر هەسـارەو ئەسـتێرەكانی ئاسمـانی بینـی كەوتـەخوارەوە قـژی دەڕوتێتـەوەو كەچـەڵدەبێ سەریـشی وەك هەسـارەو ئەسـتێرەی ئاسمـان سەری جیهانە.

*ئەگەر هەسارەو ئەستێرەكانی بـەڕۆژ بینی بەڵگـەی ئابڕووچـوون‌و ناوبانگـەو بەڵگەیـە لەسـەر ڕوودانـی ڕووداوی گەورەو بەڵاو نەهامەتی تیابەر.

*هەسـارەی بـەیان بەڵگەیـە لەسـەر هاوسـەرگیری‌و ئاهـەنگ‌و ئەگـەر لەكۆشكەكەیدا هەسارەی بەیانی بینی‌و لەشـەوێكی تاریـك‌و چـەتووندابوو ژنـی بەبوكێنی بۆ دەگوێزنەوە.

*ئەگـەر بینـی ژنـی بـۆ دەگوێزنـەوە هەسارەی بەیان هەڵهاتووە.

*هەسـارەو ئەسـتێرە بـچووكەكان كـەڕووناكی‌و نوریـان كـزە بەردەسـت‌و خزمەتكارو رەشەخەڵكە.

*ئەگـەر بـوو بەهەسـارە دەوڵەمەنددەبێ.

*ئەو هەسارەو ئەستێرانەی بەڵگەن لەسەر زستان غەمو پەژارەن ئەوانەشی بەڵگەن لەسەر هاوین بژێویو خێرە.

**هەستکردن بەرووداوی پەنهان:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر زۆری خێرو دڵنیابوون لەخراپە بەپێی ئایەتی: ﴿وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ﴾ (الأعراف: ١٨٨).

**هەگبە(توێشەبەرە):** (نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ژنی باشو چاك لەگەڵ هاوڕێ ئەمینو نهێنیو ماڵ پارێز. ئەوەی لەتوێشەبەرە تیرێكی دەرهێنا كوڕێكی نێرینەیدەبێت، ئەوەی هەگبەو توێشەبەرەیەك بكڕێت یاخود بیدۆزێتەوە ژنێكدەهێنێت.

*هەروەها دەڵێن: هەگبە سامو هەیبەتە بۆ دوژمنان ، یاخود قەڵاو ناوچەیەكە، ئەوەی ببینێ هەگبەو توێشەبەرەیەك دەبەخشێ دەستەڵاتو فەرمانڕەوایی بەدەستدەهێنێتو، هەگبەش بۆئەوەی شایستەبێت بۆ پۆستو فەرمانڕەواییە بۆ عەرەبیش ژنە.

**هەلاج:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زۆر سەرسامە بەخۆی.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر فریاكەوتنو پشوو دوای ماندووبوون، هەروەها پیاوێكی پەروەردەكارە ڕێنومایی خەڵكیدەكات.

*كەسێكە مامەڵە لەگەڵ گەلو كۆمەڵێكی خراپەكار دەكاتو بەفرۆفێڵ پارەیان لێوەردەگرێ.

**هەلاجی لۆكە:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر زانا یاخود دادوەر كاروبارەكان لەسەر دەستی ئەودا بەجێدێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ئەو رەخنەگرەی چاك لەخراپ جیادەكاتەوە یاخود پیاوێك زۆر ژن بهێنێتو منداڵو وەچەی زۆر بخاتەوە.

**هەلامەت:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر نەخۆشییەكی سووكو چاكبوونەوەو ئیرەیی بردن.

**هەڵبژاردن:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی لەخەودا ببینێت لەلایەن نەتەوەو كەسەكانی خۆیەوە هەڵدەبژێرێت پلەوپایەیەكی بەرز بەدەستدەهێنێت، بەڵگەش لەسەری ئەوەیە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ﴾ . (القصص:٦٧)

**هەڵبەستراو:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ئەوەیە کەئاژەڵدەیخوات.

**هەڵدان(تێگرتن):** پیاوێك هات بۆلای (ئیبن سیرین)و گوتی: دووریز خەڵکم دی هەریەك شتیاندەگرتە ئەوانی دی، ریزێکیان کاتێ هەڵیاندەدا دەیانپێکا بەڵام ریزەکەیتر نەیاندەپێکا، ئەویش وتی: ئەو دووریزە دوو کۆمەڵن ناکۆکی لەنێوانیاندا هەیە، ئەوانەی دەیانپێکا حەق پەیڕەوی دەکەن و ئەوانەشی نەیاندەپێکا قسەوگوتەی بەتاڵدەکەن.

*ئەگەر تیری هاویشت پێکای و لەپێناوی پەروەدگاردابوو خوداوەند وەلامی دوعاکانیدەداتەوە، ئەگەر لەپێناوی دنیادابوو شکۆمەندی و رێزی دنیا بەدەستدەهێنێت.

*ئەوەی بەرد دەگرێتە کۆتر توانج دەگرێتە ژن، ئەگەر بینی داربوندقێکی گرتوە قسەوگوتەیەك دەکات لەکاتێکی ناشیاودا، ئەگەر پێکای لێیوەردەگرێ، وەگەرنا قسەوگوتە دەبێت بەبەلاونەهامەتی بەسەریەوە.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێتەلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: لەخەودا دیم بەتیروکەوانێك رم هەڵدەدەم و دەمێك دەیپێکم و دەمێکیش نایپێکم ئەویش وتی: لەخوابترسە، تۆ کەسێکی باسی خەڵکیدەکەیت.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی بەمەنجەنیق هەڵدەدات ناپاکی و پلانە.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر قسەی ناشیرینگوتن بەزانایان و باسکردنیان یاخود تاوانبارکردنی ئافرەتانی داوێنپاك و نکوولیگرتن لەئاین.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر فیتنەو ئاشوب لەو شوێنەدا کەلێی دانراوە.

*تیرهاویشتن لەخەودا بەلگەیە لەسەر قسەوگفتوگۆکردن دەربارەی ئابڕووی خەڵکی.

*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر زرگاکردنی پەیامبەران، ئەگەر تیرەکان نێزەیان پێوەبوو پەیامبەری شیفادەرن و مەبەستیان پێمەیسەردەبێت، ئەگەر نێزەیان پێوەنەبوو بەلگەیە لەسەر ناهومێدی.

*ئەگەرتیرهاوێژ خۆی نیشان و پێکراوبێت ویست وخوازی بەدەستدەهێنێت لەنزیکبوونەوە لەپەروەردگار، ئەگەر لەدنیادابوو رێزو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی تیر دەگرێتە خەڵکی بەقسەو گوتاری ناشیرین دەدوێت بەرانبەریان.

*ئەگەر بینی تیردەهاوێژێ و هەڵەدەکات زمانێکی پیسی هەیەو دەکەوێت بەسەر ئابڕووی خەڵکیدا.

*ئەگەر بینی تیردەهاوێژێ بۆ مەبەستێ‌و هەڵەناکات خواست‌و ویستی بەدەستدەهێنێت بۆ کارێك نامەیەك یاخود نوێنەرێك دەنێرێ.

*ئەگەر تیرێك بگرێتە مرۆڤێك بەلام نەیپێکێ گوتارو قسەی پووچ‌و بەتاڵدەکات بەرانبەری، ئەگەر پێکای گوتەکانی بەوچەشنەیە کەدەیکات بەرانبەری.

*ئەگەر بینی لەشاخێکەوە رم‌و تیر هەڵدەدات بەرووی رۆژهەلات‌و رۆژئاواداو جل‌وبەرگێکی سپی پۆشیوە دەستەلات‌و پلەوپایەی دەستگیردەبێت ئەگەر شایستەی ئەوەبێت.

*ئەگەر رم‌و تیرەکانی لەلانەو مالی دەستەلاتەوە هەڵدا نووسراوو نامەیە دەینێرێ.

*تیرهاوێژی بەداری (بندق) بەردەبارانە، هەروەها دەڵێن: لەشاردا بەردەبارانی ئەوکەسەیە تیرەکە دەهاوێژی، ئەگەر تیرهاوێژ لەدەریادابوو بۆ راوچیبوو دەستکەوتە.

*ئەگەر تیرێکی هەڵداو خوێنی لەبەر رۆیی سوودو قازانجێکدەکات لەلایەن پیاوێکی مەزنەوە.

*ئەگەر تیرەکان دڵیان پێکا بەختی منداڵێکی خۆشەویست‌و جوانکیلەیە یان کیژێکی شۆخ‌و شەنگ.

*ئەگەر بینی بەمەنجەنیق بەرد دەهاوێژێ روو بەقەلایەکی دوژمن قسەیەکی چاکە دەکات یاخود دوعایەکە لەبارەگای پەروەردگار دەیکات.

**هەڵسان:** (نابلسی) دەڵێت: هەڵسانی مرۆڤ بەکاری خێر لەپێناوی خوداوەنداو لابردنی خراپەیە.

*ئەگەر خەوبینەر لەوانەبوو چاوەڕێی بەرەنگاری لێدەکرا خەڵکی خێروچاکەو پشووی لێدەبینن، ئەگەر بارهەڵگربوو دەگەڕێتەوە سەر حالی خۆی، ئەگەر نەخۆشبوو درێژخایاندەبێ نەخۆشییەکەیەتی، هەروەها ئەو منداڵەی ناتوانی هەڵبسێ بەڵگەیە لەسەر سستی‌وخاوی بژێوی.

**هەڵکوتانەسەر:** (نابلسی) دەڵێت: هەڵکوتانەسەر لەخەودا دزی یان سیخوڕی‌و جاسوسییە بەسەر ئەوەی لەخەودا مەبەستییەتی مرۆڤ یان هەربوونەوەرێکیتر.

**هەڵکۆڵ (بەردتاش):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر هەڵکۆڵینی بەسوودبوو دەبێت بەخاوەنی دنیاو جوانییەکانی.

*ئەگەر هەڵکۆڵینی قورئان لەبەرد مامۆستای فێرکاری نەزانینە، ئەگەر هەڵکۆڵینەکەی لەبەر تەختەبوو ئاشکرا نەبوو یان هەڵکۆڵەری دووڕووە.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی بەلگەیە لەسەر زانیاریو رێبازی چاکە.
*دەگونجێت بینینی بەلگەبێت لەسەر فروفێڵو هەڵخەڵەتاندن.
*هەڵکوڵەری مس ئاژاوەو نەخۆشییە روو لەسەردەکات.
*هەڵکوڵەری زێرو زیوو دانابیەکی دیارە یان دانانی شتێکە لەشوێنی خۆی.
*هەڵکوڵەر جوانکاریدەکات.

**هەلگرانی عەرشی خوایی:** (نابلسی) دەڵێت: بینینیان لەخەودا شکۆمەندیو هێزو رێکەوتنو خۆشەویستیو هاورێیەتییە، بینینیان بەلگەیە لەسەر رەوشتی چاكو پاكی بیرو باوەرو نزیکبوون لەدروستکراوە تایبەتمەندەکانی پەروەردگار.

**هەلگەرانەوە:** هەلگەرانەوەی مرۆڤ لەخەودا بەلگەیە لەسەر هاوەڵپەیداکردن بۆ پەروەردگارو دۆڕاندنی دنیاو قیامەت.
*ئەگەر لەپێشەوە بۆ دواوە هەلگەرایەوە تەوبەدەکات بۆلای خواو بەلگەیە لەسەر رووبەڕووبوونەوەی خەڵکی.
*لەپەوڕووکەوتن بەلگەیە لەسەر نەخۆشیەکانی هەناوو ناخ، ئەگەر خەوبین ژنبوو روو وەردەگێڕێ.

**هەلم:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەلم جوان مامەڵەکردنە لەگەڵ خەڵکی.
(نابلسی)دەڵیت: هەلمێنەرو بوخوردان خزمەتکارێکی بەڕەوشو هەستناسکە، خاوەنەکەی ستایشو پیاهەڵدان بەدەستدەهێنێت.
*بۆ نەخۆش بەلگەیە لەسەر مردنو بۆنی خۆشو دوکەڵکردن پێی پیاهەڵدانە لەگەڵ مەترسیدا، بەڵام عەنبەر بەدەستهێنانی ماڵێکە لەلایەن پیاوێکی رێزدارەوە.
*میسكو هەموو بۆنێکی رەش خۆشحاڵییە.
*ئەوەی ببینێ هەلم دروستدەکات ئەوا خێرو رزقو رۆزی دەستدەکەوێت.
*هەلمکردن دەوڵەمەندییە بۆ هەژار.
*دەگونجێت بوخورد بەلگەبێت لەسەر زانیاریو ئاین.
*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر هاوەڵایەتی ئاشکراو بەرچاو.
*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر بەرتیلدانو رێککەوتن لەگەڵ ناکۆكو دژدا یاخود خزمەتی قارەمانو بەدەرخستنی نهێنی نێو ناخو خۆشەویستکردنە لای خەڵکی.
*دەگونجێت بەلگەبێت لەسەر خۆشەویستیو ئەوینداریی.

*بوخوردی ئاهەنگ لەخەودا:
+ملکەچکردنی دوژمنو سەرکەوتنە.
+هێوربوونەوەیە لەترسو بیم.
+بەتاڵکردنەوەی جادووسیحرە.
+بەدەستهێنانی رزقو رۆزییە بۆ خاوەنەکانی، لەگەڵ ئەوەی مەبەستیەتی لەخەودا.

(نابلسی) دەڵێت: هەڵم لەخەودا بریتییە لەهەڵمی ئاوو تاریکایی.

*ئەو هەڵمەی لەدەم دێتەدەرەوە لەزستاندا ئەگەر لەخەودا بینیو خەوەکەش لەهاویندابوو بەڵگەیە لەسەر نەخۆشیو نهێنی شاراوە بەدەردەکەوێت. ئەگەر خەوبینەر رێنماییکرابوو وێڵو سەرگەرداندەبێت، ئەگەر زانابوو بیدعەیەکی دیارو بەرچاو دادەهێنێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر درۆو قسەو گوفتارێکی بێسوودو کەڵك.

**هەڵنوتان**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەرکەس ببینێ پەنجەی قاچی هەڵنوتا لەزەوی قەرزی لەسەر کۆدەبێتەوە، ئەگەر خوێنی لێهات بەلاو نەهامەتی رووی تێدەکات. هەروەها دەڵێن: ماڵو دارایی حەرام بەدەستدەهێنێت.

**هەڵهاتن (راکردن)**: (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوە بۆرێبازی خوداو پاشگەزبوونەوە لەگوناهو تاوان بەپێی ئایەتی: ﴿ فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾ (الذاريات: ٥٠).

*هەڵهاتن دەستەڵات یان تەوبەو مەرگە.

*ئەگەر بینی لەدوژمنێك كەلێی دەترسێ هەڵدێت دڵنیادەبێت لێی.

*ئەگەر زانایەك هەڵهات دادگا بەدەستدەهێنێ چونكە (موسا (سەلامی خوای لێبێت) دادگەریكرد دوای هەڵهاتنی.

*ئەگەر بینی هەڵدێتو ناترسێ ئەوە دەمرێ بەپێی ئایەتی: ﴿ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ الْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ الْمَوْتِ ﴾ (الأحزاب: ١٦).

*ئەگەر بینی هەڵهاتو دەیزانی هەڵهاتنەكەی بۆچییە تەوبەدەكات.

*هەڵهاتنی سوپا سەركەوتنەو، هەڵهاتنی بێباوەڕانیش هەڵهاتنە بەپێ ئایەتی: ﴿ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِكُمُ الرُّعْبَ ﴾ (الأحزاب: ٢٦).

**هەڵواسین**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەڵواسین سێبەشە:
١)هەڵواسین بەزیندوێتی.
٢)هەڵواسین بەمردوویی.
٣)هەڵواسین دوای كوشتنو تیاچوون.

*ئەگەر بینی بەزیندوێتی هەڵواسراوە پلەوپایەو رێزو چاکسازی لەئایندا بەدەستدەهێنێت، ئەگەر بینی بەمردوویی هەڵواسراوە بەرزیو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێ وێڕای خراپی لەئایندارێتییدا، ئەوەشی بەکوژراوی هەڵواسرا پلەپایەو بەدەستدەهێنێتو درۆی لەگەڵدا دەکرێ.

*ئەگەر بینی هەڵواسراوەو نازانێ کەی هەڵواسراوە ماڵو داراییەکی بۆ دەگەڕێننەوە لەکیسیچوە.

*هەندێکدەڵێن: هەڵواسین بۆ دەوڵەمەند خراپە دەگونجێت هەژاربێت، چونکە هەڵواسراو بەرووتی هەڵدەواسرێ، بۆ هەژارانیش بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی، بۆ سەفەرگەرانی دەریایی بەڵگەی بەدەستهێنانی ویستو خوازە لەوسەفەرەداو قوتاربوونو رزگارییە لەناسۆرییەکان.

*هەندێکیتر دەڵێن: ئەگەر بینی هەڵواسرابوو بەدەروازەکانی شارەوەو خەڵکی تەماشایاندەکرد پلەوپایەو شکۆمەندی بەدەستدەهێنێتو بەهێزو لاواز دێنە ژێر دەستەڵاتیەوە.

*ئەگەر خوێنی لەبەر رۆیی ژێردەستەکانی سوودی لێوەردەگرن.

*ئەگەر بینی گۆشتی کەسی هەڵواسراو دەخوات ماڵو دارایی‌و سوودو قازانج بەدەستدەهێنێت لەبەرپرسێکی بەرزو بالاوە.

*هەروەها دەڵێن: غەیبەتی دەستەڵاتدار یا بەرپرسێکدەکات ئەگەر ئەوەی دەیخوات شوێنەواری نەبێت.

*دەگێڕنەوە (شافعی) (رەزای خوای لێبێت) لەخەودا دەبینێ لەزینداناییە لەگەڵ پێشەوای باوەڕدارانداو هەڵواسراون بەپشتا، ئەم خەوەی بەهەندێك لەراڤەکارانی خەو راگەیاندو ئەوانیش وتیان: خاوەنی ئەم خەوە ناوبانگدەردەکاتو ناوبانگی بلاودەبێتەوە، پاشان (شافعی) بەوچەشنە ناوبانگی دەرکرد (رەزای خوای لێبێت).

*لەسەردەمی (یەزید)ی کوڕی (مهلب)دا پیاوێك دێت بۆلای (ئیبن سیرین) و دەڵێت: لەخەودا بینیم (قەتادە) هەڵواسرابوو، ئەویش دەڵێ: ئەو پیاوە رێزدارە گوێی لێدەگرن، هەر لەورۆژگارەدا (قەتادە) خەڵکی هاندەدات دابنیشنو بەشدارینەکەن لەگەڵ (یەزید).

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا پلەوپایەی بەرزە بۆ هەڵواسراو، ئەگەر بینی

هەڵواسراوە شایستەی پلەوپایەبوو بەدەستیدەهێنێت، ئەگەر لەسەر پشت گیانی دەرچوو ئایندازی لەشوێنی دەستەڵاتەکەی کزدەبێ.

*ئەگەر هەڵواسراو نەمرد دەستەڵاتێك دەگرێتەدەست ئاینی پارێزراودەبێت‌و دادپەوەر دەبێت لەجێی دەستەڵاتیدا.

*ئەگەر بینی هەڵواسراو لەگەڵ خەڵکی گشتیدابوو ملکەچ‌و تووڕەدەبێ.

*ئەگەر گۆشتی هەڵواسراوی خوارد خێری دەستگیردەبێ لەکۆمەڵ‌و نەتەوەیەکی گەورە.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر گۆشتی هەڵواسراوی خوارد کاری پۆستەچیدەکات، ئەوەشی ئەوکارە بکات کۆچی دواییدەکات.

*ئەگەر بینی لەدەروازەکانی شار هەڵواسراوەو تەماشایدەکەن پلەوپایەو دەستەڵات بەدەستدەهێنێ‌و کەسانی بەهێز لەژێر دەستیدا دەبن، ئەگەر خوێنی لەبەر ڕۆیی ژێردەستەکانی سوودی لێوەردەگرن.

*ئەگەر بینی لەخەودا هەڵدەواسرێ بەڵگەیە لەسەر سەرۆکایەتی بەپێی ئەو شوێنەی تێدا هەڵواسین ئەنجامدەدرێ.

*هەڵواسین بەڵگەی خێرە بۆ هەژاران‌و بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتنی شتەپەنهان‌و نادیارەکان‌و بۆ دەوڵەمەندیش بەڵگەی خراپە چونکە بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی کاروبارەکانیان، ئەوەی هاوسەری نەبێت بەڵگەیە لەسەر هاوسەرداری‌و ئەوەی دەیەوێت لەماڵەکەیدا بمێنێتەوە یان دەترسێ ڕوو لەلایەکبکات بەڵگەیە لەسەر هاتنەدەری لەناوچەو شوێنی خۆی.

*هەڵواسین بەهەڵگەڕاوەیی بەڵگەیە لەسەر ناچارکردن‌و گەڕانەوە لەسەفەر.

**هەڵوژە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەڵوژە لەکاتی خۆیدا ڕزق‌و ڕۆزی یان کەسێکی غەریب‌و ونبوە دەردەکەوێت، بەڵام گەر لەکاتی خۆیدا نەبوو نەخۆشیە دێت بەسەریا.

*هەڵوژەی زەرد یا سەوز غەم‌و پەژارەیە ڕووی تێدەکات.

*ئەگەر بینی نەخۆشێك هەڵوژە دەخوات چاکدەبێتەوە، ئەوەی خاوەن ناونیشان‌و بنەڕەتێکی خراپبێت لەیەك دەم‌و کاتدا کۆدەبنەوە لێی.

**هەڵۆ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەهێزترین باڵندەیەو لەهەموویان بەرزتر دەفڕێ‌و چاوی ئێجگار تیژەو تەمەنیشی درێژە.

*ئەگەر هەڵۆیەکی بینی یاخی بوبوو دەستەڵاتدار تووڕەبوە لێی‌و سپاردوویەتی بەپیاوێکی ستەمکار.

*ئەگەر گوێڕایەڵ نەبوو لێی نەدەترسا حاڵوباری بەرزدەبێتەوەو دەبێت بەکەسێکی مەزنی سەرکێش‌و لەئاینەکەیدا ڕۆدەچێ.

*ئەگەر بەئاسماندا فڕی‌و خۆیکرد بەتەختانێکدا دەمرێ، ئەگەر هاتە دەرەوە دوای ئەوەی چوە نێو تەختانەکە نزیکدەبێتەوە لەمردن بەڵام قوتاردەبێت لێی.

*ئەگەر پەڕو ئێسکەکەی بەدەستهێنا ماڵ‌و سامانێکی مەزن بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر لەسەرپشتی کەوتەخوارەوە غەم‌و پەژارە ڕووی تێدەکات‌و، دەگونجێت تیابچێت.

*ئەگەر بەچکە هەڵۆیەکی بۆ نێردرا کوڕێکی بەناوبانگی پێدەبەخشرێ، ئەگەر بەڕۆژ ئەوەی بینی نەخۆشیەکە نزیکیدەکاتەوە لەمردن.

*ئەگەر هەڵۆ برینداریکرد نەخۆشیەکەی درێژەدەخایەنێت.

*هەروەها گوتراوە: هەڵۆ خەلیفەو پادشای گەورەیەو ئەوەی ببێت بەخاوەنی زەفەر دەبات. گۆشتی هەڵۆش ماڵ‌و دەستەڵاتە.

*ئەگەر بوو بەخاوەنی هەڵۆ تەمەنی درێژ دەبێت، هەموو باڵندەیەکی دڕندە وەك هەڵۆو باز دەدرێتەپاڵ دەستەڵاتدار ڕێزە.

*ئەگەر باڵندەیەك هەڵیگرت‌و بردیە ئاسمان یاخود نزیکبوەوە سەفەر دەکات بۆ شوێنی دوور بەئەندازەی ئەو باڵندەیە.

*ئەگەر چوە نێو ئاسمان لەو سەفەرەدا دەمرێ.

*هەموو جۆرە فڕینێك باشە لەلێکدانەوەداو فڕین بەڕێکی بەنێو ئاسماندا مەرگە یان زەرەرو تیاچوون‌و زیانە.

(نابلسی)دەڵێت: باڵندەی سەربڕاو بەڵگەیە لەسەر مردنی پادشایەك.

*ئەگەر دووگیانێك هەڵۆیەکی بینی دایەن‌و شیردەرو بەخێوکەر دەبینێ.

*هەڵۆ بەگەورەترین پادشاو فەرمانڕەوا یان بەپێغەمبەران‌و پیاوچاکان باسدەکرێ.

*ئەگەر گوێی لەهەڵۆیەکبوو دەنگی بیست ناکۆکی لەگەڵ مرۆڤێکدا بۆ دروستدەبێ.

*هەڵۆ بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژی.

*هەروەها بەڵگەیەلەسەر ماڵێکی زۆرو جەنگ‌و شەڕ، دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر بیدعەو وێڵی‌و سەرگەردانی بەپێی ئایەتی:

﴿ولا تذرُنّ وداً ولاَ سُوَاعًا ولاَ يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسرًا وَقَدْ اضَلُّوا كَثِيراً﴾ (نوح: ٢٢ـ ٢٣).

*دەگونجێت هەڵۆ بەڵگەبێت لەسەر منداڵ.

*ئەگەر هەڵۆیەك لەئاسمانەوە بەرەو زەوی هات هیچ كارێكی بۆ بەجیٚ نایەتو دەستەڵاتەكەی بەسەردەچێت.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: دەستەڵاتدارێكی ستەمكارە هیچ ئەمەكدارییەكی نییە لەخوار بازەوەیە لەپلەوپایەدا، ئەگەر بوبوو بەهەڵۆ پلەوپایەیەك وەردەگریٚ بەڵام بەخێرایی لەكاردەخریٚ.

**هەڵـە:** (نابلسی) دەڵێت: هەڵەكردن لەخەودا بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو دانانی شتێك كەلەشوێنی خۆیدا نەبێت.

**هەڵهاتن لەشوێنێكەوە بۆ شوێنێكیتر:**

(نابلسی)دەڵێت: هەڵهاتن لەترسا یان بەهۆی خێرایی جموجوولەوە بینی بەڵگەیە لەسەر گوتەی نیگەرانكەری هەراسان.

*هەڵهاتن لەسەرەوە بۆ خوارەوە جیابوونەوەی حاڵوبارێكی نوێیە لەگەڵ ئالودەبوونی حاڵێكی خراپ.

*هەڵهاتن بەخێرایی بەرزبوونەوەی پلەوپایەی مرۆڤە.

**هەڵكەندن:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەوەی ببینیٚ زەوییەك هەڵدەكەنێتو زەوییەكەش وشكبوو بەئەندازەی ئەوە ماڵو دارایی دەستدەكەوێت، ئەگەر زەوییەكە تەڕبوو فێڵ لەمرۆڤێكدەكات لەپێناوی ئەوەی بەدەستیدەهێنێتو لەو جێگەو شوێنەدا ماندوویەتی رووی تێدەكات بەئەندازەی شێی ئەو زەوییە.

*چاڵهەڵكەندن بەڵگەیە لەسەر:

+فێڵ.

+دەستبڕینو چاوبەست.

+تۆڕووداو.

+شوێنو جێگەی داوێنپیسان.

+زیندانو كۆتو بەندو هاوچەشنی ئەوانە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی زەوییەك هەڵدەكەنێتو خاكو خۆڵی لێدەردەدات ئەگەر نەخۆشبوو یاخود نەخۆشی هەبوو گۆڕەكەیەتی، بەڵام ئەگەر لەسەر سەفەربێت بەجێگەیاندنی سەفەرەكەیەتیو خاكو خۆڵەكەش رزقو رۆزیو دەستكەوتە.

*ئەگەر بینی چاڵهەڵدەكەنیٚ یان بیرو جۆگەلە، ئەگەر وایزانی بەو هەڵكەندنە دەكات بەئاو ئەگەر بۆ خۆیبێت بژێوی تایبەتە، وەگەرنا رزقو رۆزی گشتییە، ئەگەر ئاوی لەبەر رۆیی گرێیەكە روو لەبژێویو رزقو رۆزیدەكات.

*ئەگەر لەكاتی هەڵكەندندا وایزانی كەسێك دەخاتە نێوی فرۆفێڵ لەوكەسەدەكات.
*ئەگەر خۆی چوە نێو چاڵەكە فرۆفێڵە تۆبالۆ ئەستۆی خۆیدەبێتەوە بەبێنەوەی ئەو كەسەبیەوێت.
*ئەگەر بینی لەو خاكو خۆڵە دەخوات هەڵیكەندوە لەو ماڵەی بەدەستدەهێنێت دەخوات.
*ئەگەر خۆی لەچاڵێكدا دییەوە ژنەكەی تەڵاقدەداتو لێی جیادەبێتەوە.
*ئەگەر خۆی لەسەر لێواری چاڵێك بینیەوە بەڵام نەچوە نێو چاڵەكە دژایەتی دەكەوێتە نێوانیان، پاشان ئاشتدەبنەوە.
*ئەگەر بینی لەچاڵێكی بچووك دێتە دەرەوە ئەگەر نەخۆشبێت یاخود زیندانی قوتاردەبێت.
*ئەگەر بینی لەنێو چاڵێكدا ونددەبێتو هیچ دەروازەیەكی تیا نییە فێڵی لەگەڵ دەكرێت بەئەندازەی چاڵەكەو فراوانیو گوشاری.
*ئەگەر بینی دەكەوێتە نێو چاڵێكەوەو هانا بۆ كەسانێكدەبات دەریبهێننەوە بەڵام كەس نایەت بەهانایەوە ئەو چاڵە چاڵی خۆیەتی، چاڵیش بەڵگەیە لەسەر سەفەرێكی نزیك، هەروەها چاڵ فرۆفێڵە، هەروەها پیشەیە بۆ یەكێك ئالوودەی بێت.
*چاڵ ژنێكی هەژاری داپۆشراوە.
*دەگونجێت چاڵ بەڵگەبێت لەسەر هێمنی لەترسو قوتاربوون لەناڕەحەتی بەتایبەت ئەگەر یەكێك تێیدا ونبێت بەتایبەت ئەگەر دوژمنبێت.
*ئەگەر لەنێو چاڵەكەدا خواردنێكی خۆشی یان ئاوێكی سازگاری تێدابوو یان پۆشاكێك عەورەتی خۆی پێ داپۆشێ رزقو رۆزییەكی بۆ دێت لەلایەكەوە هەرگیز پەی پێنەبردوە یاخود لەگەڵ كەسێكی ناكۆكو نەیاردا ئاشتدەبێتەوە.
(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر كاربەسەربردنو بەجێهێنانی بۆ خاوەنەكەی، مەگەر ئەوە هەڵبداتەوە كەدەخورێ یان ئەوەی سوودو قازانجی تێدایە ئەوجا بەخراپی مامەڵە لەگەڵ ئەو رزقو رۆزییەدەكات كەخوداوەند پێیبەخشوە.
*ئەگەر گۆڕی ناسراوێكی مردووی هەڵدایەوە بەدوای رێبازی ئەو مردوەدا دەگەڕێ لەدنیادا ئەگەر زانابوو یاخود خاوەن ماڵو سامانبوو بەو ئەندازەیە بەدەستیدەهێنێ.

*ئەگەر بینی گەیشت بەمردوویەك لەگۆڕەکەیدا هەتا هەڵیدایەوەو بینی زیندوە لەنێو گۆڕەکەیدا داوای چاکەو خێروماڵی حەلاڵە ، خۆئەگەر بەمردووی بینی هیچ خێرێکی تێدا نییە داواکەی.
*ئەگەر روویکردە گۆڕستانێك‌و هەڵیدایەوەو بەزیندوویی‌و مردوویی بینی بانگبێژێکی ترسێنەر لەوێدادەبێ.
*گۆڕهەڵکەن داوایەکی نهێنیدەبێت چونکە عەرەب بەنادیاری شەڕو خێرو ناو زەدیدەکات.
*ئەگەر گۆڕی زانایەکی شارەزای هەڵدایەوە رێبازەکەی دەگرێتەبەرو زیندووی دەکاتەوە.
*بەهەمان شێوەیە هەڵدانەوەی گۆڕی پێغەمبەریش(ﷺ)وایە، مەگەر بگات بەئێسکی پروکاوو پەڕۆی لەت‌و پەت رزیو دەچێت بۆ بیدعەو رووداوێك.
*ئەگەر بەمردوویی بینی‌و پاشان لەگۆڕەکەی هاتە دەرەوە دەگات بەویست‌و خوازی‌و رێبازی زیندودەکاتەوە.
*ئەگەر گۆڕی بێباوەڕێکی هەڵدایەوە یان کەسێکی بیدعەکار یان کەسێکی ناموسوڵمان شوێنی رێبازی خەڵکی‌و وێڵ‌و سەرگەردان دەکەوێ یاخود چارەسەری بێماڵی‌و سامانی بەحەرامدەکات یا بەفرۆفێڵ.
*ئەگەر گۆڕەکەی هەڵدایەوەو کەوت بەسەر کەلاکی بۆگەن لەلێکدانەوەدا بەهێزترەو پتر بەڵگەیە لەسەر خراپە.
(ئیبن سیرین)دەڵێت: هەڵکەندن لەماڵدا فرۆفێڵە، ئەگەر بینی لەماڵێکدا چاڵهەڵدەکەنی‌و دەگات پێی دەچێتە داخوازی ژنێك‌و بەفرۆفێڵ دەگات پێی.
*ئەگەر لەشارێکدا چاڵیهەڵکەند بەدوای ئاینی پیاوێکی زانادا دەگەڕێ‌و بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: "من شاری زانیاریم‌و عەلی دەرگاکەیەتی".
*ئەگەر لەسەر بەردێك هەڵکەندنی ئەنجامدا بەدوای ئاینی دەستەلاتدارێکی دڵرەقدا دەگەڕێ.
(نابلسی)دەڵێت: چاڵی قەلاکان بەڵگەیە لەسەر چوونە لای کەم ، لەگەڵ گەڕان‌و پشکنین‌و بەدوای هەواڵداچوون.
*هەروەها بەڵگەیە لەسەر تێکچوونی ماڵ‌و سامان‌و تێکچوونی حاڵی منداڵان.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شوێنکەوتنی شوێنەوارو هەواڵ.
*ئەگەر بینی لەماڵێکدا چاڵیهەڵکەندو گەیشتە ناوەکەی دەگات بەئافرەتێك‌و فێڵی لێدەکات.

**هەنار:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەنار ماڵێکی کۆکراوەیە ئەگەر خۆش و بەتامبێت، دەگونجێت لانەو کونجێکی ئاوەدانبێت یان گرێیەکبێت.

*داری هەنار پیاوە، دەگونجێت ژنبێت.

*هەنار ترس وبیم و غەم و پەژارەیە.

*دەگێڕنەوە پیاوێکدێت بۆلای (ئیبن سیرین)و دەڵێت: هەنارێکم بەدەستی خۆمەوە دی، ئەویش وتی: ژنێکە دەیکەیت بەهاوسەری خۆت، ئەگەر بیخۆیت باشە .

*هەروەها هەنار کوڕەو بەڵگەیەلەسەر:

+دەستەلآتداری ولآت و شارێکی ئاوەدان.

+زەوییەکی ناوازەی سەرنج راکێش.

+ماڵ و دارابیەکی جەمی بازرگان.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر بینی هەنارێکی دەنك سووری بەدەستهێنا هەزار دینار بەدەستدەهێنێت، ئەگەر دەنکەکەی سپیبوو هەزاردرهەم بەدەستدەهێنێت، ئەگەر شیرینبوو شادی و خۆشییە، ئەگەر ترشبوو غەم وپەژارەیە.

*ئەگەر هەنارێك بفرۆشیٚ پیاوێکە دنیا هەڵدەبژێریٚ بەسەر قیامەتدا.

*ئەگەر بینی تویکڵی هەنار دەخوات لەنەخۆشی دەپارێزریٚ.

*گوشینی هەنارو خواردنەوەی ئاوەکەی خەرجی پیاوە بۆ خۆی.

*داری هەنار بەڵگەیە لەسەر بچڕانی پەیوەندی خزمایەتی.

*هەناری نادیار نازانریٚ شیرینە یان ترشە لەئاستی شیرینیدایە مەگەر گوتەی خەوبینەر بەڵگەبێت لەسەر شتێکیتر.

(نابلسی) دەڵێت: هەنار بۆ دەستەلآتدار بەشارێك لێکدەدرێتەوە ئەگەر شکاندی شارێك ئازاد دەکات، توێکڵەکەی سنوورەکەیەتی و دەنکەکەی پیاوەکانیەتی.

*ئەگەر توێکڵی هەنار بخوات لەخەودا لەنەخۆشی چاکدەبێتەوە.

*هەرنا بەسندوقێکی داخراو ناو زەددەکریٚ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر شانەی هەنگ.

*ئەگەر رەنگی هەنارەکە سپیبوو بەڵگەیە لەسەر درهەم، ئەگەر سووربوو بەڵگەیە لەسەر داچڵەکان یاخود گەشتێك.

*ئەگەر هەنار بەژن لێکدرایەوە ژن جوان و شۆخ شەنگە، ئەگەر باخبوو کچە، ئەگەر هەنارەکە شکابوو بێوەژنە.

*هەناری بۆگەن ژنێکی بێئابڕووی داوێنپیسە.
*هەناری ترش ماڵێکی حەرامە، هەروەها دەڵێن: غەمو پەژارەیە.
*ئەگەر هەنارێکی بفرۆشێ کەسێکە دنیای بەسەر قیامەتدا هەڵبژاردوە.
*گوشینی هەنارو خواردنەوەی شەربەتەکەی خەرجی پیاوە بۆ خۆی.
*هەناری نەناسراو نادیار کەوا نازانرێ شیرینە یاخود ترش وەك شیرینی وایە.
*دارهەنار پیاوێکی شانو شەوکەتدارە، دڕکەکانی ڕێگرە لەخراپەو سەپێچی، ئەگەر دەستەلاتداربوو زاڵدەبێت بەسەر دەستەلاتدارانی دی، ئەگەر بازرگانبوو بازگانی زیاددەکات.
*بڕینی دارهەنار بەڵگەیە لەسەر بچڕانی پەیوەندی خزمایەتی.
*دەگونجێت دارهەنار بەڵگەبێت لەسەر راچڵەکان.
*هەروەها دەڵێن: هەناری شیرین رزقو رۆزییەکی حەلاڵە بەماندوبوون بەدەستدێت، ترشەکەشی غەمو پەژارەیەو هەناری تێکەڵیش رزقێکە گومانی تێدایە.

**هەناسە:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: هەڵمژینی هەناسەی ناسوودەیی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کارێك ئەنجامدەدات غەمو پەژارەی لێدەکەوێتەوە.

**هەناسەی خۆشی دەربڕین( ئاه پێداهاتن ):** (نابلسی)دەڵێت:ئەوەی لەخەودا پیاوێك ببینێ هەناسەی خۆشی دەردەبڕێت دەستبەکارێك دەکات سەرەتاکەی غەمو پەژارەیە یاخود بەلاو نەهامەتی، هەناسەی شادیو خۆشی هەڵمژینیش بەڵگەیە لەسەر ئەو خەمو خەفەتەی لێدەکەوێتەوە.

**هەنجیر:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: هەنجیر ماڵێکی زۆرە، دارەکەشی پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندە زۆر سوودمەندبێتو دوژمنایەتی ئیسلام رووی تێبکەن، چونکە داری هەنجیر کونەمارەو لێخواردنیشی بەڵگەیە لەسەر وەچەی زۆر.
*هەندێکدەڵێن: هەنجیر رزقو رۆزییەکە لەلای عێراقەوەدێت، کەمێك خواردن لێی رزقو رۆزی بێخەشو پاکە، زووربەی راڤەکارانی خەویش لەسەرئەوەن هەنجیر باشە چونکە خوداوەند بەمەزنی داناوەو لەقورئانی پیرۆزدا سوێندی پێخواردوە، کۆمەڵێك لەراڤەکارانیش رقیان لێبوەتەوەو

دەڵێن بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە بەڵگەشیان فەرمایشتی پەروەردگارە لەمیانەی چیرۆکی (ئادەم)و (حەوا) کاتێ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ﴾(البقرة: ٣٥).

*هەندێکیتر دەڵێن: هەنجیر غەمو پەژارەیە بۆئەوەی دەیخوات و دەستیدەکەوێت.

(نابلسی)دەڵێت: ئەوەی ببینێ لێیدەخوات وەچەو نەوەی زیاددەکات و دەڵێت: هەنجیر رزقو رۆزییەکە لەلای عێراقەوە دێتو ماڵو دارابیەکی کۆیەو بۆ خاوەنەکەی زیاددەکات بێماندوبوونو شوێنەوارەکەشی بەسەریا دیاریدەدات.

*کەمێك هەنجیرخواردن رزقو رۆزی ئاسانە. هەر هەنجیرێك بخورێ هەزار دینار یان دە هەزار درهەمە دەکەوێتە دەستی.

*هەروەها دەڵێن: هەنجیر ماڵێکی بەرچاوە.

*گەلای هەنجیر غەمو پەژارەی نەبراوەیە، ئەوەی بیخوات غەمو پەژارە رووی تێدەکات لەگەڵ پەشیمانی.

*هەنجیر بەپیاوچاکانو هەڵبژاردە راڤە دەکرێت، یان بەرزقو رۆزی ئاسانو خۆشی تەواوو نازو نیعمەتی خۆشنوود.

*هەنجیری رەشیش لەوادەو کاتی خۆیدا خێرە.

*هەنجیری سپی باشترە لەرەش.

*ئەگەر هەنجیری لەکاتی خۆیدا نەدی بەڵگەیە لەسەر ئێرەیی بۆ خەوبینەردێتەروو.

*دەگونجێت هەنجیر بەڵگەبێت لەسەر سوێند، ئەگەر وابێت دەگونجێت ئەو سوێندە درۆبێت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر غەمو پەژارە گواستنەوەی لەشوێنی بەرزەوەیە بۆ شوێنی نزم.

**هەنجیرو ترێ:** دەگونجێت هەنجیری سەوزو ترێ سپیکە لەزستاندا بەڵگەبێت لەسەر باران.

*هەنجیری رەشو ترێ رەشکەش بەڵگەن لەسەر سەرماو سۆڵە .

*دەگونجێت بەشەوو رۆژیش لێك بدرێتەوە، ئەمەش دەچێتە دەروازەی لێکدانەوەی کەسییەوە، خەمو خەفەتیش لێرەدا نابات و چونکە باران وێرای سوودو قازانجی بەلام بۆ گەشتوگوزارو موسافیر بەربەستو کۆسپەو بۆ کاسبیش پشووە ، جاری واش هەیە رووخانو قوڕاویکردنی گشت لایەکی لێبەرپادەبێت.

**هەنسك:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەنسك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوکەسە تووڕەدەبێتو دەدوێتو قسەدەکات لەسەر بابەتێکی نەشیاوو نەخۆشیەکی سەختو توند دەگرێ.

**هەنگ:** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی پلەوپایەو سوودو قازانج.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر گوندنشینو ماندوانو ئەوانەی رەنجدەدەنو دەکۆشن.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانایانو ئەوانەی خاوەن کتێبن چونکە هەنگوین شیفایەو هەنگیش نیگای بۆ نێردراوەو فێری پیشەیەککراوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەرباز چونکە میرو سەرکردەیان هەیە کەشاهەنگەو ئەسپو ئاژەڵیان هەیە.

*هەروەها گوتراوە: هەنگ مرۆڤێکی کاسبو بەسوودەو مەترسی گەورەیە، ئەگەر کۆمەڵێ هەنگی بەدەستهێنا دەستکەوتو ماڵ بەبێ ماندوبوون بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر پادشایەك بینی شوێنی هەنگی گرتوە شارێکی ئاوەدانی بەسوودی حەلاڵ بۆ خۆی داریدەکات، ئەگەر چوە نێو پوورەکەی زاڵدەبێت بەسەریا، ئەگەر هەنگوینی لێدەرهێنا هیچی بۆ هەنگەکان بەجێنەهێشت ستەمیان لێدەکات، ئەگەر بەشی خۆی بردو پشکی ئەوانی وازلێهێنا دادپەروەر دەبێت لەگەڵیان.

*ئەگەر کۆمەڵێك هەنگ کۆبوەوە لێیو پێوەیاندا هاوکاریدەکەنو زیانی لێوەیان پێدەگات.

*ئەگەر کوشتنی لەو پوورەیەو دووریاندەخاتەوە.

(نابلسی)دەڵێت: فەرپێتە لەگەڵ دەوڵەمەندی بۆ یەکێك هەیبێت وێڕای بوونی مەترسی.

*ئەگەر پوورەی هەنگی بینیو هەنگوینی لێدەرهێنا ماڵی حەلاڵی بەدەستهێناوە.

*ئەگەر هەنگوینەکەی بردو هیچی بەجێنەهێشت بۆ هەنگەکە ستەمو زۆرداری لەکۆمەڵێکدەکات، ئەگەر پشکێکی بۆ جێهێشت دادپەوەردەبێت، ئەگەر فەرمانڕەوا یاخود خوازیاری حەقبوو.

*ئەگەر بینی هەنگ بەسەریەوە دەنیشێتەوە پلەوپایە بەدەستدەهێنێ، ئەگەر پادشاو فەرمانڕەوایەك خەونێکی لەوجۆرەی بینیو دەستەلات بەدەستدەهێنێ بۆ کشتیاران بەڵگەی

خێرو فەڕو پیتە، بۆ سەرباز بەڵگەی شەڕو ئاژاوەیە.

*هەروەها بەڵگەیە لەسەر سەرباز چونکە شوێنی میرەکەی دەکەوێت.

*ئەوەی هەنگ بکوژێ دوژمنەو کوشتنی هەنگ بۆ کشتیاران باش نییە چونکە رزقو رۆزیو بژێوی لەوەوەیە.

*ئەگەر هەنگی لەشارێکی چۆڵ بینی سەربازانی بێخێر هێرش دەبەنەسەر ئەو شارە.

*هەنگ بەڵگەیە لەسەر:

+لێدان.

+نەخۆشی.

+خەڵکی گوندنشین.

+سوپای ئیسلام.

+نهێنیدەرخەرو ئەوانەی نهێنی دەدۆزنەوە.

**هەنگباز( هەنگبڕ):** (نابلسی)دەڵێت: خاوەنی هەنگەو بینینی بەڵگەیە لەسەر جەنگاندنو ماڵو سامان بردانو ئابلۆقەو پۆشینی چەك.

**هەنگوین:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەنگوین میراتیەکی حەلاڵە یان ماڵو دەستکەوتە یاخود شەریکابەتییە.

*ئەگەر هەنگوینی لەبەردەستی خۆیدابینی بەڵگەیە لەسەرنەوەی زانیارییەکی بەڕێزی هەیە، ئەگەر بینی دەرخواردی خەڵکیدەدات قورئاندەخوێنێتەوە لەنێوان خەڵکیدا بەتۆنێکی خۆشو دڵڕفێن.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەبەردەمیدا هەنگوینی دانراوی بینی زانیاریەکی بەرزی هەیەو دەیەوێت خەڵکی گوێبیستی بن، ئەگەر هەنگوینەکە بەتەنیابوو ئەوە ماڵێکی حەلاڵە لەدەستکەوتێکەوە پێگەیشتوە، ئەگەر لەدەبە یان کوپەیەکدابوو ماڵێکی جەمی حەلاڵی دەستدەکەوێ.

*خواردنی هەنگوین بەڵگەیە لەسەر بەدەستهێنانی شەهیدی لەجەنگدا.

*هەروەها هەنگوین بەڵگەیە لەسەر نەخشەو پلان، هەنگوینی پاڵفتەو ساغ بەڵگەیە لەسەر کرداری چاكو باشی تایبەت.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر حەلاڵ یان تالانی یاخود بەزۆر لەخەڵك زەوتکردن، هەروەها دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

*دەگونجێت هەنگوین بەڵگەبێت لەسەر گەواهیدان بیدات یان بۆییدەن.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: هەنگوین بۆ ئایینداران تامو چێژی باوەڕو قورئانخوێندنە لەگەڵ کرداری چاکەو بۆ

دنیاویستان بەدەستهێنانی دەستکەوتە بەبێماندوبوون.

*هـەروەها هـەنگوین بەڵگەیـە لەسـەر قورئان چونکە خوداوەند وتـەی خۆی بەچارەسەروشیفا ناوبردوە.

*لـە(ئـیبن سـیرین)ەوە دەگێڕنـەوە وتوویـەتی: هـەنگوین رزق و رۆزییـەکی زۆرە خاوەنەکـەی بەبێمانـدوبوون بەدەستیدەهێنێت لەبەرئـەوەی ئاگری بەرنەکەوتوە.

*هـەنگوین لەلایـەکیترەوە رزقێکـی کەمەوە بەماندوبوون دەستگیردەبێت.

*ئەگەر بینی ئاسمان هـەنگوینی باران بەڵگەیـە لەسـەر باشـی و بـوونی فـەڕو بەرەکەت.

*ئەگـەر بینـی هـەنگوینی نـەپاڵێوراو دەخـوات و لەسـەریەوە هـەنگوینی پـاڵێوراو هـەبوو هەنـدێك لەراڤـەکاران رقیـان لێدەبێتـەوەو بـەمارەبڕینی دایکیان لێکداوەتەوە.

*دەگێڕنـەوە پیاوێـك دێـت بـۆلای پێغەمبـەر (ﷺ)و دەڵێـت: تامـاریی و هـەورێکم بینـی رۆن و هـەنگوینی دەبارانـد و خـەڵکیش دەیانگرتـەوەو هەنـدێك زۆرو هەنـدێکیش کـەم، (ئەبوبەکر) (رەزای خوای لێبێت) وتـی: بـاڵێکی بدەمـەوە ئـەوە قورئـان و تـام و چێژیەتی لەگـەڵ نـەرمونیانی و خـەڵکی هەیانە زۆری دەخوێنی و هەندێکیشیان کەم[1].

*هـەروەها دەگێڕنـەوە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: "لەخـەودا بینـیم لەگومـەزێکی ئاسـندابووم و هـەنگوین لەئاسمانـەوە دادەبـەزی و پیـاو یـەك پەنجە یان کەوچکێك یاخود دووانیـان لێدەبردو هەیشبوو زیاتری دەخـواردو هەشبوو بەشلی دەیخوارد" (ئەبوبەکر) (رەزای خوای لێبێت) فـەرمووی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا بـا راڤـەی بکـەم، گومەزەکـە ئیسلامەو هەنگوینەکـەش کەلـەئاسمان دادەبـەزێ قورئانـەو ئەوەشی کەوچکێك یان دوانـی لێدەبرد سـوورەتێك یـا دوان فێردەبـێ و ئەوانەشـی لێسایانەوە کۆیدەکەنـەوە، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "راستدەکەی".

*هـەروەها دەگێڕنـەوە (عەبـدوڵلا)ی کـوڕی (عومـەر) فەرموویـەتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا: لەخـەودا بینـیم ئـەو دوو پەنجەیـەم هـەنگوینیان لێدەچۆڕێت و منیش بەپەنجە دەیخۆم،

---

[1] (متفق علیه) : (بوخاری) لـە(کتاب التعبیر) فەرموودەی ژمارە (٧٠٤٦)، و(مسلم) لـە(کتاب الرؤیا) (١٧٧٧/١٧/٤).

پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: "تۆ قورئان دەخوێنیتەوە"[1].

*پیاوێك لەخەودا بینی نانیدەكرد بەهەنگویندا و دەیخوارد ئنجا حەزی لەزانیاریدەكرد لەگەڵ دانانیدا، پاشان سوودی لەوە وەرگرتو ماڵو داوای زۆربوو چونكە هەنگوین بەڵگەیە لەسەر باشی زانیاریو نانیش لەلای چاپەوەیە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت: هەنگوین ئەوشتەیە كەقسەو وتەكانی پێدەڕازێنێتەوە، ئەمەش لەسەردەمی (عومەر)ی كوڕی (عەبدولعەزیز)دابوو.

(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا ماڵێكی زۆری حەلاڵە یان ماڵو سامانێكە لەدەستكەوتدا بەدەستیهێناوە یان لەشەریكایەتیدا.

*هەنگوین بۆ ئاینداران تامو چێژی ئاینو قورئانخوێندنو كاری چاكەیەو بۆ دنیاویستان بەدەستهێنانی ماڵو سامانە بەبێماندوبوون.

*هەروەها هەنگوین رزقێكی كەمە لەروویەكەوە ماندوبوونی تێدایە.

*دەگونجێت هەنگوین بەڵگەبێت لەسەر چێژتنی تامو چێژ لەجووتبوون لەگەڵ ژندا یان هی پیاو هەروەك لەفەرموودەدا هاتوە: "هەتا تامو چێژی هەنگوینەكەی بكەیو ئەویش تامو چێژی هەنگوینەكەت بكات".

*دەگونجێت هەنگوین بەڵگەبێت لەسەر خەمو پەژارەو ئیرەییو خۆپاراستن لەپلانیان چونكە هەنگوین مێشو زەردەواڵەو مێرووڵەی لێكۆدەبێتەوە.

*هەنگوینی ساغو پاڵفتەكراو بەئاگر دەرووە دوای ناڕەحەتیو كوڕێكە دوای تەواوبوونی وادەی نێو رەحەمو هاوسەرێكە دوای تەواوبوونی خولی مانگانە ماڵو سامانێكە بەزەكات پاكدەبێتەوە، زانیاریەكی پاكو پوختە لەبیدعەو گومانو رێنومابیەكە دواتر سەركەردانی بەسەرا نایەت.

*هەنگوینی ساغ ماڵێكی پاكو پوختە، هەروەها دەڵێن: ماڵو داراییەكە بەماندوبوون دەستگیردەبێ.

*هەنگوین چارەسەرە لەنەخۆشی.

*هەروەها دەڵێن: خواردنی هەنگوین ماچكردنی خۆشەویستە.

*ئەگەر بینی هەنگوین دەلێسێتەوە هاوسەرگیری دەكات لەگەڵ یەكێكدا

---

[1] (ئەحمەد) لە(مسندە)كەیدا (٤٨٢/٦) فەرموودەی ژمارە:(٧٠٦٧)هێناویەتیو (هەیسەمی) لە(مجمع)دا(١٨٤/٧)هێناویەتی.

نــانو هــەنگوین بخــوات چــونکە بژێوییەکی باش بەدەستدەهێنێت.
**هەوا(کەش)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ناوەکەی، ئەگــەر خــۆی بەوەســتاوی یــان دانیشتوویی یاخود جموجووڵەوە بینی لەسەر ویستوخوازی ئاینەکەی دەبێت یاخود لەدنیادا ڕۆدەچێت.
*ئەگەر لەنێو کەشتیەکدابوو لەدەریادا ترسی شکاندنی هەیە، ئەگەر لەترسو بیمــدابوو رووی تێــدەکات، ئەگــەر نەخۆشبێت لەتیاچوون نزیکدەبێتەوە، ئەگەر لەشوێنی خۆیدا کەوتەخوارەوە تێکدەچــیو کردارەکــانی ئــارەزوو زاڵدەبێت بەسەریا بەپێی ئایەتی: ﴿ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴾ (الحج: ٣١).
*ئەوەی لەدوادا دروستدەکرێ یاخود سـواری دەبــێ ئەگــەر نەخۆشـبوو دەمرێو دارەمەیتو گۆڕەکەیەتی.
*ئەگەر سەوزبوو شەهیددەبێ، ئەگەر فەرمانڕەوا یاخود دادوەرێك خەوێکی ئاوای بینی لەسەرکارەکەی لادەبرێ، ئەگەر کەسێك خەوێکی وابیینی گرێی هاوســەرایەتی بەســتبوو تووشــی مەترسیدەبێتو ئەگەر کەسێك ئەوەی بینــی کەلــەدەریادابوو کەشــتیەکەی دەشکێ یان لەتیاچوون نزیکدەبێتەوە لەیەکێك لەو کارانەدا.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سەفەر لەدەریاو وشکانیدا، ئەگەر بەبالْ فڕی بەهێزترە بۆ خاوەنەکەیو سەلامەت دەبــێو دەگونجێــت باڵــەکانی مــاڵو سامانبێت هەڵبسێ یان دەستەلاتێکبێ لــەژێر ســایەیدا ســەفەر بکــات ، مەلــەکردنیش لەهــەوادا هــەر بــەو شێوەیەیە.
*ئەگەر بەبێ باڵبوو بەڵگەیە لەسەر گــۆڕان لــەوەی رووی تێــدەکات لەتێکۆشانو سەفەر ئەگەر لەکاتی خۆیدانەبوو لەدەریا یان وشکانیدابوو.
*ئەگەر بینی بەباری پانیدا فڕی بەئاسماندا سەفەرێکی دوور دێتەبەری.
*ئەگەر خەوەکە تایبەتبوو نێوانی خـۆیو ئاسمـان رەشـدەبێت، ئەگـەر تایبەتبوو بەسەرۆك چاوی کوێردەبێو رووناکی لەچاوی دەفڕێ.
*ئەگەر زانایەك ئەو خەوەی بینیو لەخەودا دەگریان یان دەپاڕانەوە ناڕەحەتی روویان تێدەکات بەپێی تاریکاییەکەی بەهۆی فیتنەو غەمو پەژارەو نەبوونی قاتو قرییەوە.
(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا لەنێوان ئاسمانو زەویدایە شکۆمەندیو

پلەوپایە بەهۆی دەستەلاتەوە بەدەستدەهێنێ، ئەگەر خەوبینەر خاوەنی ئومێدو لەخۆباییبوونبوو خەونەکەی پووچو بەتاڵە.

*ئەگەر بینی بەنێو هەوادا دەڕۆیی بەبێئەوەی سەربکەوێت شکۆمەندیو ماڵێکی حەلاڵ بەدەستدەهێنێ ئەگەر شایستەبوو، وەگەرنا سەفەردەکات ئەگەر ئومێدخوازبوو.

*ئەگەر بینی هەڵواسراوە لەنێوان ئاسمانو زەویدا دڵی سەرقاڵدەبێتو نازانێت چیدەکات.

*ئەگەر کەوتەخوارەوە پلەوپایەو شانو شەوکەتی دەکەوێت، ئەگەر پایەدارنەبوو نائومێددەبێت لەکارێك کەخوازیاریبوە.

*هەروەها دەڵێن: ئەوەی لەهەوادا بکەوێتە خوارەوەو غەمباربێت دەرووی لێدەکرێتەوە.

*هەوای ساف بۆ یەکێك خوازیاری سەفەربێت یاخود پیشەوەرێك پیشەکەی وابەستەی تیشکی خۆرو هەوابێت باشە.

*هەروەها بەئارەزووی نەفس لێکدەدرێتەوە ئەوەی سەرپێچی ئارەزووی بکات بەهەشتیدەبێت.

*ئەگەر خۆی بینی لەنێوان ئاسمانو زەویداو قسەینەکرد خێری دەستگیر دەبێ لەگەڵ ماڵو سامانو شکۆمەندی.

*ئەگەر بینی لەسەر هەوا دانیشتوە ئەوە ئارەزوو تێکەڵ بەئاینەکەی دەکاتو لەخۆی بایی دەبێت.

**هەواڵگەر:** (نابلسی)دەڵێت: بەیەکێك دەگوترێت بەدوی رووداوو کردار بکەوێتو بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر لێدوانو قسەکردن دەربارەی ئابڕووی خەڵکی، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سیخوڕیو جاسووسی.

**هەواڵو ژیاننامەگێڕەرەوە:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئاگاداربوون لەهەواڵو گواستنەوەی هەواڵو دەنگوباسی راستو درۆو بردنەسەری بەڵێنو وادە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر ژیاننامەی ئامۆژگاریدەرو زاناو شوێنەوارناسان بەباسکردنی رووداوی پەنهانو نادیار.

**هەور(گەواڵەهەور):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەور بەڵگەیە لەسەر ئاینی ئیسلام هۆکاری ژیانو قوتاربوونەو هۆی بەزەیی میهرو سۆزە کەخوداوەند ئەو ئاوە هەڵدەگرێ بۆ بەندەکانی کەپێیدەژێنەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر زانیاریو فیقهوداناییو روونکردنەوە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+سەربازو هاوەڵان.
+حوشتری هاتوو کەبەئاوخواردن دەژێتەوە.
+کەشتی چارۆکەدار کەلەئاودا دەرواتو نەلەزەویو نەلەئاسماندایەو بەهۆی باوە دەچێت بەرێوە.
+ژنی دووگیان چونکە ژنو هەور هەردووکیان ئاویان هەڵگرتووە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر باران خۆی چونکە لەخۆیەتیو بەهۆی ئەوەوەیە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر سزای دەستەلاتدارو بریارەکانی، ئەگەر گەواڵەهەورەکە رەشبوو یاخود شتێکی وای لەگەڵدابوو بەڵگەبێت لەسەر سزا.
*ئەگەر هەوری لەماڵی خۆیدا بینی یاخود دابەزییە ژوورو ماڵەکەی موسوڵماندەبێ ئەگەر بێباوەربێتو زانیاریو دانایی بەدەستدەهێنێت ئەگەر باوەرداربێت، یاخود هاوسەرەکەی دووگیاندەبێ ئەگەر خوازیاربێ یان حوشترو کەشتیەکەی یا ئوتومبیلو هەرشتێکی دیکەی رووی تێبکەن.

*ئەگەر خۆی بینی سواری گەواڵەهەوربوە یاخود بینی دەروات بەرێوە ژنێکی چاکو باشدەبێ بەهاوسەری ئەگەر رەبەنبێت یا خوازیاری سەفەرو (حەج)بێت، وەگەرنا بەزانیاریو دانایی لێکدەدرێتەوە ئەگەر خوازیاربێت ئەگەر وانەبێ تیپێکی سەرباز بەکێشیدەکەن یاخود بەیاوەری ئەوان بەرێدەکەوێ، وەگەرنا فەرمانرەوا بەرزیدەکاتەوە بەهۆکارێکی باڵاو نوێ.
*ئەگەر گەواڵەهەورێکی رێچکەبەستووی دووبەدوویەکی بەدیکردو خەڵکی چاوەرێبوونو لەوگەواڵەهەورانەبوو روو لەو شوێنە دەکرێ خەڵکی گومانی پێدەبەنو بەو چەشنەدەبێ خێرو چاکەی هەڵگرتبێ یان سەربازو کاروان رووی تێبکات.
*ئەگەر بینی لەسەر زەوی کەوتەخوارەوە یاخود کەوت بەسەر ماڵەکاندا یا کێڵگەکان یا دارو درەختو رووەکدا، لافاوو بارانو کوللەو باڵندەیە، ئەگەر لەخەونەکەدا نیشانەی وای تیابوو بەڵگەبێت لەسەر زیان وەك رەشەباو ئاگرو مارو دووپشك هێرشێکە دەکرێتە سەریانو دەدات بەسەریاندا، یاخود هاوەڵ کاروانێکە هەواڵێکیان بۆ

دەبـات مـەرگی زۆرێـك لەوانـەی سـەفەریانکردووە لـەخۆگرتوە یـان گیراون و غەرامـەکراون یـاخود باخێکـە مـیری و دەسـتەلاّتدار دەیخاتـە ئەستۆیان، یان بیروبۆچوون و بیدعەیە لەنێوياندا بلاّودەبێتەوە.

*هەنـدێکی دیکـەدەڵێن: هـەور پادشـایەکی بەتوانایـە یـاخود دەسـتەلاّتدارێکی بەسـۆزو بەزەییـە، ئـەوەی تێکـەڵ بەهـەوربێت تێکـەڵ بەپیاوی لەو چەشنەدەبێ.

*ئەگـەر هـەوریخوارد سـوود لـەماڵی حەلاّلی پیاوێك وەردەگرێ یـان سـوود لەدانایی وەردەگرێ، ئەگەر کۆیکردەوە دانـایی لـەپیاوێکی ئـاوا وەردەگـرێ، ئەگەر بوو بـەخاوەنی دانـایی و موڵك و دەستەلاّت بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەر بینی مـاڵ و خانوویەك لەهـەور دروسـتدەکات دنیایـەکی رێـزداری حـەلاّڵ و دانـایی و بـەرزی و شـکۆ بەدەستدەهێنیت.

*ئەگەر کۆشکێکی لەهـەور دروستکرد خـۆی لـەگوناهو تاوانـدەپارێزێ بـەو دانایيەی سـوودی لێوەرگرتـوەو خێـری زۆر بەدەستدەهێنێت.

*ئەگـەر هـەوری بینـی لەدەسـتدابوو بـارانی دەبارانـد دانـایی بەدەستدەهێنێت.

*ئەگـەر بینـی خۆیبـوە بەهـەورو باراندەبارێنێ بەسـەر خەڵکیـدا مـاڵ و دارایی بەدەستدەهێنێت و خەڵکی سوود وەردەگرێ لێی.

*ئەگەر هـەور بـارانی تێدانـەبوو ئەگـەر خـۆی دەسـتەلاّتخوازبوو دەبێـت بەدەستەلاّتدارو دادپەوەر نابێت.

*ئەگـەر بازرگـانی خوازبـوو بـەڵێنی بەجێناهێنێت و دەستەبەری ناکات.

*ئەگـەر پیـشەوەربوو لەپیـشەکەیدا شـارەزاو دانادەبێـت و خـەڵکی پێویستیان پێیدەبێ.

*هـەور فـەرمانڕەواو دەسـتەلاّتدارە قـسەی بەسـەر خەڵکیـدا دەڕوات و خـەڵکی قـسەو دەسـتەلاّتیان بەسـەریا ناڕوات.

*ئەگەر هەورێك بـەرزبوەوەو بروسـکەو گرمـەی تێـدابوو دەرکـەوتنی دەسـتەلاّتدارێکی بەهەیبەتـە بەحـەق هەڕەشەدەکات.

*ئەگەر هەورێکی بینی لەئاسماندا هاتە خوارەوەو بـارانی باراند بەشێوەیەکی گشتی ئیمـام و پێشەوایەکی دادپـەوەر دادەنرێ بۆ ئەو شوێنە ئەگەر هەورەکە سپیبوو یان رەش.

*هـەوری سـوور ئەگـەر لـەکاتی خۆیدا نەبێ بـەلاّو نەهامەتییـە یـاخود فیتنـەو نەخۆشییە.

*هەندێکدەڵێن: ئەگەر هەورێکی بینی لەزەوییەوە روو بەئاسمان بەرزبوەوەو وڵاتی تاریککرد بەڵگەیە لەسەر خێرو چاکە، ئەگەر خەوبینەر خوازیاری سەفەربوو بۆی دێتە پێشو بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە، ئەگەر دڵنیانەبوو لەشەڕو خراپە پارێزراو دەبێو دەگات بەهیواو ئاواتی خۆی.

*هەندێکی دیکە دەڵێن: ئەو هەورەی لەزەوییەوە بەرزدەبێتەوە روو بەئاسمان بەڵگەیە لەسەر سەفەر یان هەوری رەش بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە.

*هەوری رەشیش بەڵگەیە لەسەر سەرمایەکی سەختو پەژارە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر تێکەڵ بەهەوربوو بەڵام هیچی لێهەڵنەگرت تێکەڵ بەزانایاندەبێو هیچ لەزانیاریەکەیان ناگۆڕێ بۆ کردار.

*ئەگەر سواری هەوربوو ناوبانگی بەرزو بڵندەبێتەوەو لەدانایی‌دا بالاو شکۆداردەبێ.

*ئەگەر بینی چەکەکەی بوە بەهەور پیاوێکی رکەبەروناکۆکە، ئەگەر خۆی وانەبێ ئەوە کوڕەکەی یاخود گەورەیو هاوشێوەیەکی بەوچەشنەیە.

*ئەگەر هەورەکە رەشبوو داناییە لەگەڵ دڵخۆشیو پیاوچاکی.

*ئەگەر هەورەکە نارەحەتیو ناخۆشیو بەلای لەگەڵدابوو رکەبەرەکان دەستدرێژی دەکەن بۆ پیاوێکی دانای بەهێز.

*ئەگەر بینی هەورێك بەرزبوەتەوەو زێڕدەبارێنی بەسەریا لەپیاوێکی دانا کاروبارێکی دنیا فێردەبێ، ئەگەر هەورەکە سپیبوو بارانی باراند فەرمانڕەوایەکی دادپەروەری پیرۆز دەبێت.

*ئەگەر لەکاتی خۆیدا هەوری بینی خێرو بەرەکەتو نازو نیعمەتو ماڵو دارایی بەدەستدەهێنێت، یاخود خوداوەند رزقو رۆزی دەڕێژێ بەسەر خەڵکی ئەو شارو وڵاتەدا، ئەگەر لەنەبوونیشدابوون دەروویان لێدەکرێتەوەو لەوبارە قوتاردەبن.

*گەواڵە هەوری سپی لەخەودا بەڵگەی کردارو رەفتارە.

*ئەو گەواڵە هەورەی مرۆڤ دەیبینێ وەك ئەوەی لەزەوییەوە بەرزدەبوەوە روو بەئاسمان بەڵگەیە لەسەر سەفەرو بۆ یەکێك لەسەفەردابێت بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی لەسەفەرەکەیو دەرکەوتنی شتی نهێنی.

*هەوری سوور بەڵگەیە لەسەر بێکاری.
*هەوری تاریك‌و بۆر بەڵگەیە لەسەر غەم‌و پەژارە.
*هەوری رەش بەڵگەیە لەسەر سەرمایەکی سارد یان غەم‌و پەژارە.
*دەگونجێت هەوری سوور بەڵگەبێت لەسەر سەرباز روودەکەنە ئەو وڵاتە لەگەڵ ویست‌و پلان.
*ئەگەر بینی بەشێکی لەهەور وەرگرت دانایی بەدەستدەهێنێت یاخود کشتوکاڵی زەوی‌و زاری مردوو دەکات.
*ئەگەر بینی سواری هەوربوە یاخود بەسەریەوە دەڕوات دانایی بەشێوەیەکی تەواو وەردەگرێ.
*ئەگەر بینی هەور هات بەرەو رووی لەخەودا کرداری باش ئەنجامدەدات‌و دادپەروەر دەبێ‌و مژدەی پێدەدرێ‌و لەهەموو غەم‌و پەژارەیەك قوتاردەبێ، ئەگەر لەخراپەکارانبوو سزایەك دادەبەزێت بەسەریا.
*ئەگەر بینی هەوروتیشکی خۆری داپۆشیوە فەرمانڕەوا نەخۆشدەکەوێ یاخود تووڕەدەبێت‌و خەشمدەیگرێ یان لەدەستەڵات‌و پلەوپایەی خۆی لادەبرێ.
*(جەعفەری صادق) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ئەگەر بینی کراسەکەی لەهەورە نازو نیعمەتی خوایی دەیگرێتەوە.
*هەور بەڵگەیە لەسەر رەواندنەوەی غەم‌و پەژارەو ترس‌و بیم‌و دەرکەوتنی کاری لەرادەبەدەر "کەرامەت".
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر خۆشەویستی بەپێی ئایەتی: ﴿ اَلَمْ تَرَ اَنَّ اللهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ﴾ (النور: ٤٣).
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتنی باوەڕداران‌و مردنی کەسانی نەخۆش‌و گرفتدار بەپێی ئایەتی: ﴿ هَلْ يَنْظُرُونَ اِلاَّ اَنْ يَاْتِيَهُمُ اللهُ فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ وَالْمَلاَئِكَةُ وَقُضِيَ الْاَمْرُ ﴾ (البقرة: ٢١٠).
*ئەگەر سواری گەواڵەهەورێکبوو پلەوپایەی بەرز دەبێتەوەو بەسەلامەتی سەفەردەکات ئەگەر لەسەفەردابێ‌و سەلامەتدەبێ، ئەگەر رەبەنبوو ژنێکی رێزداردەهێنێت.
*دەگونجێت گەواڵەهەور بەڵگەبێت لەسەر غەم‌و پەژارە.
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر سەفەر لەدەریادا بەهۆی ئاوهەڵگرتنی لەنێوان ئاسمان‌و زەویدا.

**هەورەبروسکە :** (ئیبن سیرین) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر بەڵاونەهامەتی کەخوداوەند دەیهێنێت بەسەر بەندەیا یاخود دووریدەخاتەوە لەوەی کەخۆی دەیەوێت وەك کوللەو سەرماو رەشەباو نەخۆشیو گەڕیو لەرزوتاو...

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تەندروستی باشو دەستەلاتدارییەکی گەورە کەلەلایەن پادشایەکە دەبێتو تێدا تیاچوونو فەوتانی لەخۆگرتبێ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هاتنی دەستەلاتداری ستەمکارو بەڵگەیە لەسەر دابەزینی بۆسەرزەوی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر رووداوی بەناوبانگ.

*ئەگەر هەورە بروسکەی بینی دای لەماڵەکەی ئەگەر نەخۆشبوو دەمرێ، ئەگەر کەسێکی سەفەریکردبوو دەگەڕێتەوە.

*ئەگەر هاوەڵێکی دەوری دەستەلاتداریدابوو پێداویستیو خوازی بۆ بەجێدێت، وەگەرنا دزێك هەڵدەکوتێتەسەری یان ئاگری تێبەردەبێ یاخود ماڵەکەی دەڕوخێ.

*ئەگەر هەورە بروسکەی بینی دەدات لەماڵان دەگونجێت لەنێو خەڵکیدا هەواڵێك هەبێ بەگەڕانەوەی کەسێکی ئاوارە یان حاجی یاخود تێکۆشەرانی.

*ئەگەر هەورەبروسکە لەسەرزەویو کێڵگەو بێستانو کەسانی باجگریدا خراپە روودەکاتە خەڵکی ئەو ناوچەیە. (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا سزایە ئەگەر لەو ناوچەیەبداتو بروسکە هەبوو.

*هەورە بروسکە بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی بۆ یەکێك بیسوتێنێ، ئەگەر شتێکی بەسوودی سووتاند بەڵگەیە لەسەر زیانو بازاڕ ساردی.

*هەورە بروسکە ئاگادارییە بۆ کەسێك گوناهو تاوان ئەنجامبداتو ترسو بیمێکی زۆرسەختو توندە.

*ئەگەر بینی هەورەبروسکەیەك لەشارێکیداوەو زەوییەکەی سووتاندوە دەستەلاتدارێك روودەکاتە ئەو شوێنەو خراپەکاری تێدا بڵاو دەکاتەوە یان جەنگو قاتو قڕیو گرانیەکی توندی تیابەرپادەکات.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر هەورەبروسکە بەبێئاگر روویدا ئەوە دەستەلاتداری داهاتوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر هەڕەشەی دەسەلاتدارو توورەیی.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر پەیمانی باشو فەرمانی دروست، چونکە فەرمانی فریشتەی هەورەکانە بەهەڵسانو بەخشینو نمەدان.

*هەورەبروسکە بەڵگەیەلەسەر:
+مۆسیقاو جەنگو چوون بەرەو دوژمنو هەستان.
*هەوریش بەڵگەیە لەسەر سەربازو برووسکەش نێزەیە لەگەڵ ئاڵای رەنگاو رەنگ.
*بارانیش بەڵگەیە لەسەر خوێنی رژاوو ناڵەناڵی هەوریش بەڵگەیەلەسەر مەرگ.
*ئەگەر هەورەبروسکەی دی لەئاسماندا فەرمانی ئەسپەردەکردنە لەدەستەڵاتدارەوە.
*ئەگەر بینی ئەو هەورەبروسکانە بارانیان بەدواوەیەو خەڵکی زۆر پێویستیان بەباران نەبوو بەڵگەیە لەسەر بارانو ئەو بەڵێنانەی فەرمانڕەوا داویەتی بەخەڵکی.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دووڕوو لەگەڵ مژدەدان بەدوو باروحاڵ.
*ئەگەر خەوبینەر باران زیانی پێدەگەیان وەك موسافیرو بیناسازو جلشۆرو دورێنەو ئەوەی هەمان حاڵی ئەوانیان هەیە باران بەڕێوەیەو دەبێت زرنگیو بێداری خۆیان وەربگرن.
*ئەگەر لەگەڵ چەخماخەدا گرمەو ناڵەی بیست دڵنیادەبێت لەهەورەبروسکە بۆ ئەوەی بەڵگەیە لەسەری، ئەگەر لەو حاڵەدا خۆر دیاربوو هیچ بارانێك نەباریبوو ئاگاداری لەلایەن دەستەڵاتەوە بۆ دێت کۆمەڵێك رووبان تێدەکات یاخود مژدەیەکیان بۆ دەنێرێ، یاخود کۆمەڵێك کەس بەئەرکو دەستەڵات رادەسپێرێ یان رووبەناوچەو جێگەیەك رەوانەیان دەکات.
*ئەگەر لەگەڵ ئەوەدا بارانو تاریکیو هەورەبروسکە هەبوو لەئاسمانەوە سەرماو کوللەو مێشوولەو دەردو بەلاو مەرگ یاخود فیتنەو ئاشووبو جەنگ رووبان تێدەکات ئەگەر ئەو ولاتە ولاتێکی جەنگ ئاسابوو یان خەڵکی چاودێری ئەوەیاندەکرد لەدوژمن.
*هەندێکدەڵێن: هەورەبروسکە بێباران ترسو بیمە، ئەگەر هەورەبروسکەی دی قەرزێك دەداتەوە، ئەگەر نەخۆشبوو چاکدەبێتەوە ئەگەر زیندانیکرابوو ئازاددەکرێ.
*هەورە بروسکەو باران ترسو بیمە بۆ کەسی موسافیرو بۆ ئەوەشی نیشتەجێیە تەماعو چاوبرسێتییە.
*هەروەها دەڵێن: هەورەبروسکە هاوکاری پۆلیسی پادشاو بەرپرسێکی مەزنە.
*هەندێکیتر دەڵێن: هەورەبروسکەو چەخماخە بەڵگەیە لەسەر فروفێڵو

بەتاڵو درۆ، هەروەها دەڵێن: دەنگی هەورەبروسکە بەڵگەیە لەسەر ئاژاوەو جەنگو هەراو ناکۆکی.
(نابلسی) دەڵێت: ئەوەی گوێی لەهەورە بروسکەیەکی توندبێت لەهەر ولاتێك یاخود دەنگێکی بەرزبیستێ لەناکاو دەمرنو فیتنەو ئاشووبو کوشتار دەکەوێتە نێویانەوە.
*هەروەها دەنگی هەورەبروسکە بەڵگەیە لەسەر:
+ناکۆکیو هەراو مقۆ مقۆ.
+کەمو کورِی لەئایندەو زیان لەماڵو دارایی.
*ئەگەر گوێی لەهەورەبروسکەبوو لەگەڵ باراندا لەکاتی خۆیداو خەڵکی پێویستیان بەباران بێت بەلاّم دەنگەکەی گەورە نەبێت فەرِپیتە روو لەخەڵکی ئەو ناوچەیە دەکات.
*ئەگەر هەورەبروسکە ببینێ بەدەر لەچەخماخە بەڵگەیە لەسەر تیرۆرو فروفێڵو درۆهەڵبەستن، ئەوەشی دەنگی هەورەبروسکە دەبیستێ گوتەیەك لەفەرمانرِەوا دەبیستێ پێی ناخۆشدەبێ.
*گوێبیستبوونی هەورە بروسکە هیچ خێرێکی تێدانییە ئەگەر تاریکاییو چەخماخەی لەگەڵدابوو، ئەگەر هاوکات لەگەڵ زەمینلەرزەدابوو.

*بیستنی هەورەبروسکە لەکاتی خۆیدا بەڵگەیە لەسەر مژدەو فەرِوخێر، ئەگەر لەکاتی خۆیدا نەبوو بەڵگەیە لەسەر جموجووڵی سوپا بۆ داگیرکاریو فیتنەو ئاشووب.
*دەگونجێت گوێبیستبوونی بەڵگەبێت لەسەر یادی خواو سلاّواتدان.
*دەگونجێت گوێبیستبوونی بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشیو گوێ لەدەنگی دەفگرتن لەئاهەنگدا، ئەگەر گوێلێبوونی ئەستەمبوو تەوبەدەکات یاخود موسوڵماندەبێت.
*دەگونجێت گوێبیستبوونی بەڵگەبێت لەسەر کەرِبوون، ئەگەر گوێبیستی هەورەبروسکەبوو لەخەودا ئەو رۆژە رێکەوتی (تشرینی یەکەم)بوو بەڵگەیە لەسەر مەرگ لەولاتی (شام)، ئەگەر لەشەورۆژدابوو خواردن هەرزاندەبێتو خواردنەوەو میوە لە(میسر) زۆردەبێ.
*ئەگەر لەهەموو مانگەکەدا گوێبیستی دەنگی هەورەبروسکەبوو بەڵگەیە لەسەر زۆری بێزاریو بێتاقەتی.
*ئەگەر لەخەودا گوێبیستی هەورەبروسکەبوو هاوکاتبوو لەگەڵ (تشرینی دووەم)دا فەرِوخێر زۆردەبێت لەزێدی (بەربەریەکان)و (میسر)، دەگونجێت هەسارەیەکی کلکدار

دەربکەویێو لە(شام) تالآن و برۆ رووبدات یاخود لەوانەیە یەکێك لەپادشاکانی عەرەب بمرێت و بالندەوپەلەوەرو دەردو ئافاتی تێبکەوێت و زولم و ستەم لەرۆژهەلآت بەرپاببێت و بارانێك ببارێت هیچ زیان و سوودێکی تێدا نەبێت.

* ئەگەر لەخەودا هەورەبروسکەی گوێلێبوو کەوتە دەرۆژی مانگی (کانونی دووەم) بەلگەیە لەسەر مەرگی مەزنەکان لە(ئەندەلووس)و نرخی شتومەکیان بەرزدەبێتەوەو دەستەلآتیان زالدەبێت و خراپەو گەندەلی زۆردەبیّ بەرووبووم کەمدەکات.

* ئەگەرلەخەودا گوێی لەهەورەبروسکەبوو لەشەورۆژدابوو رێکەوتی(کانونی دووەم) رووداوێکی مەزن روودەدات لەزەمینلەرزەو زەوی رۆدەچێت لە(عێراق)، دەگونجێت بەلآو نەهامەتی روو لەئازەلبکات و دانەوێلە کەمببێت، ئەگەر خەونەکە لەکۆتاییدابێت هەوالدانە بەرۆژگیران و مردنی فەرمانڕەوایەك لەرۆژئاوا، هەروەها دەلێن: هەسارەیەك سەرهەلدەدات هەوالی خاپووربوونی شارێکی گەورەی هەلگرتووە، لە(شام)یش نەخۆشی و دەرد بلآودەبێتەوە، ئەگەر لەخەودا گوێی لەهەورەبروسکەبوو خەونەکەی رێکەوتی یەکەم رۆژی (شباط)بوو بەلگەیە لەسەر فەرپیتی زەوی و نرخەکەی دادەبەزێو لەزەوی (یأجوج)و (مأجوج)بەلآو نەهامەتی و نەخۆشی بلآودەبێتەوە ، هەروەها مردن لە(جەزائیر)بلآودەبێتەوەو نرخی شتومەکی خەلکی (مەککە) هەرزاندەبێت و باراندەبارێو لە(حەبەشە)ترس وبیم دەکەوێتەوە، ئەگەر لەکۆتایی ئەومانگەدابوو بەلگەیە لەسەر ئەوەی پادشایەك لە(خۆرئاوا)روو بەزەوییەکیتر دەچێت و نەیارێکی بۆ دروستدەبێت لەنێو دانیشتوانی نزیك روبارو دارودرەختداو کەمێك دەتوانیّ دەستەلآت بگرێتەدەست.

* ئەگەر لەخەودا گوێی لەهەورەبروسکەبوو خەونەکەی هەماهەنگبوو لەگەلّ شەش رۆژی (ئازار)دا بەلگەیەلەسەر فەرۆخێر لەگەنم و زەیت و بازرگانەکان دلنیادەبن و پادشاو فەرمانڕەوا لەشارێکەوە دەچێت بۆ شارێکیترو خوازو داوای بەدەستدەهێنێت و،

ماوەیەك لەدەستیدا دەمێنێتەوەو چەن ڕۆژێك دەچێت بۆ خاکی (ڕۆم)و کۆمەڵە سەرۆك‌و گەورەبەرپرسانی لەناودەبات لەخانەوادەی ئەوکەسەو خاکی (شام) فەرو پیتدەخاتەوە، ئەگەر لەکۆتاییدا هەورەبروسکە هەبوو کوللەو مەرگو مانگا زیاددەکات.

*ئەگەر لەخەودا گوێی لەهەورەبروسکەبوو وادەکەی ڕێکەوتی بیست‌ویەکی (نیسان)بوو بەڵگەیە لەسەر فەروپیت‌و باران لەوزەویەداو لەگەڵ بەروبووم‌و (روم) لەخاك‌و زێدی خۆیدەچێت بۆ شوێن‌و زێدێکیتر، ئەگەر هەمامەنگبوو لەگەڵ سەرەتای (نیسان) ڕۆژی یەکشەممە لە(ئازار)دا ناڕەحەتی‌و مەرگەسات ڕوودەدات‌و داوێنپیسی لەنێو(ڕۆم)دا بڵاودەبێتەوەو (شام) لەخراپەیان بەدوور دەبێت‌و ئنجا روو بەخاکێکیتر دەچن‌و خراپەی تیا بڵاودەکەنەوە.

*ئەگەر هەورەبروسەکە لەچوارڕۆژدابوو فراوانی‌و فەرەوەرەکەت‌و زۆربوونی گەنم‌و ترێیەو جیاوازی دەکەوێتە نێوان خەڵکی‌و دەردو نەخۆشی بڵاودەبێتەوەو ترس‌وبیم ڕوودەکاتە جوتیاران سەبارەت بەخەرمان‌و دانەوێڵەیان.

*ئەگەر لەیانزەدابوو زەمینلەرزەو ئازارو ناخۆشی ڕوودەکاتە خەڵکی، ئەگەر لەسیانزەدابووو گرانیەکی زۆر ڕوولەخەڵکیدەکات، ئەگەر لەحەڤدەیابوو رق‌و قین دەکەوێتە نێوان میرو شایان‌و وەزیرەکانیان، ئەگەر لەبیست‌ودوودابوو نەخۆشیەکی کوشندەی ترسناك بڵاودەبێتەوە، ئەگەر لەبیست‌و سێدابوو فەرو پیت ڕوودەدات، لەبیست‌و پێنجدا گرانیەکی زۆربڵاودەبیتەوە، ئەگەر لەبیست‌و نۆدابوو بەڵگەیە لەسەر خێروشادی‌و خۆشی.

*ئەگەر خەوبینەر لەخەودا هەورە بروسکەی بینی خەونەکە لەنۆ ڕۆژی (ئایار)دابوو بەڵگەیە لەسەر مەرگی ڕێزداران لە(یەمامە)و لەنێو تورکەکاندا مەرگ بڵاودەبێتەوە، هەروەها لەنێو مەڕو ماڵاتداو بارانێکی زۆردەباری‌و خێروبێری باخەکان زۆردەبن.

*ئەگەر لە(دە)دابوو نەخۆشی توندو سەخت بڵاودەبێتەوە.

*ئەگەر گوێبیستی هەورەبروسکەبوو لەخەوداو خەونەکەی لە(دە)ی مانگی (حوزەیران)دابوو بەڵگەیە لەسەر مردنی زانایان‌و بەڕێزان لە(میسر)و هەرزانی بڵاودەبێتەوە، هەروەها لەنێو

مەڕومالاَتــداو بــارانێکی زۆر دەبــارێ‌و خێروبێری باخەکان زۆردەبن.

*ئەگەر گوێبیستی هەورەبرووسکەبوو خەونەکـــەی لەشەشـــی مـــانگی (تەموز)دابوو باران لە(کانونی یەکەم)دا دەبـارێ‌و کـشتوکاڵ نـەش‌ونمادەکات، مـەزنان دەمـرن لـەخاکی (روم)و نـرخ لە(یەمەن) دادەبەزێ‌و لەخاکی عەجـەم جـەنگ روودەدات‌و شـەڕیش (میـسر) دەگرێتەوەو تالاَن‌وبڕۆ روودەدات.

*ئەگەر هەورەبروسکەکە لەکۆتاییدابوو یان حەوت رۆژی مابوو بەڵگەیە لەسـەر سەلامەتی لەسەرجەم ئەو زەویەداو نرخ لــەخاکی (بەســـرە)و (حەبەشــــە) دادەبەزێ‌و زەوی دەبوژێتەوە تا نزیك (فـورات)و هەنـدێك بـەروبووم ئافەویـەلاَ رووی تێدەکات وەك خورماو مۆز بـەلاَم گـەنم زۆردەبـێ، ئەگـەر لـەکۆتایی سـالدابوو خەڵکیترسـیان لێدەنیـشێت لەترسانیان لەفەرمانڕەواکانیان ، ئەگەر لەخـەودا گـوێی لەهەورەبرووسـکەبوو خەونەکە لەمانگی (ئاب)دابوو بەڵگەی خێروچـاکەیە بـۆ خـەڵکی (شـام)و (گورگـــان)و (ئـــەزربیجان)و دەریـــا دادەخـــرێ‌و رێگـــە لەخراپـــە پاکدەکرێتـەوەو کوللــە کەمـدەکات‌و فەرمانڕەوایـەك لـە(خـەزەر) دەمرێـت‌و کوشتار لەنێوانیان بەرپادەبێت، ئەگـەر کۆتاییەکـــەی هەورەبروســـکەبوو فەرپپیت لەخاکی(میسر) دەکەوێتـەوەو نـــرخ دادەبـــەزێ دوای نـــەبوونی‌و برسێتی‌و مەرگ.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر لـەرزە لەرزو جیاوازی کەوتنەنێو کۆمەڵەکان.

*ئەگـەر گوێبیـستی هەورەبروسکەبوو لەخەودا لەهەشت رۆژی مانگی ئەیلولدا باران‌و بەرووبووم زۆردەبێت‌و نـەبوونی‌و قـــات‌وقڕی لەســـەرەتای ســـالدا روودەدات‌و کوللــە لـەخاکی (کوفـە)و (بەسرە)دەکەوێتـەوەو کرم لەوساڵەدا دەمرێـــت‌و برســـێتی بلاَودەبێتـــەوەو موســــــوڵمانان بیروباوەڕیــــان بلاَودەکەنـــەوەو کوشـــتار لـــەنێوان موســـــوڵمان‌و رۆمـــەکان روودەدات ماوەیـەکی دوورودرێـــژ دەخایـەنێت، پاشـان (شـام) فەرپپیتـدار دەبێـت‌و بــەروبوومی پارێزراودەبێــت ئەگـــەر دەنگێکـی گـەورەی هـەبوو، ئەگـــەر لە(دە)دابوو بەڵگەیە لەسەر کەمی باران لەو ساڵەدا.

**هەوڵدان( تەقەلا ):** نابلسی) دەڵێت: لەخـــەودا پـــشووە، ئەگــــەر بینـــی رەنجـدەدات پـشوودەدات، هـــەروەها بەڵگەیـە لەسـەر فێـڵ‌و خـواردنی مـاڵی

خەڵکی بەناحەق، ئەمەش ئەگەر خەوبینەر دەوڵەمەندبوو، ئەگەر هەژاربوو بەڵگەیە لەسەر ڕەزیلیو خۆپارێزیو بوونی پشوو، دەگونجێت ماندوبوون بەڵگەبێت لەسەر کەوتنە نێو کارێکی یاساغەوە.

**هەوڵوتێکۆشان:** (نابلسی)دەڵێت: ئەوەی لەخەودا هەوڵبدات لەپێناوی شتێکدا دەگونجێت بەهیواو ئاواتی خۆی بگات چونکە گوتراوە: ئەوەی هەوڵبدات بەویستو خوازی خۆی دەگات.

**هەوڵو کۆششی مرۆڤ:** (نابلسی) دەڵێت: هەوڵو کۆششی مرۆڤ لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ماندوبوونو بەربەرەکانی مرۆڤ لەئانای نەخۆشیدا یان غەمو پەژارە یاخود دەردی پیری، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر چارەسەرو شیفای نەخۆش یان ڕێکی نەفسو بەدەرکەوتنی هێزو توانای.

**هەویر:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەویرماڵێکی ڕێزدارە لەبازرگانیدا سوودو قازانجێکە زۆری لێپەیدادەبێت بەخێرایی ئەگەر هەڵهات، ئەگەر هەڵنەهاتبوو خراپیو بەڵایە ڕوو لەماڵو داراییدەکات، ئەگەر ترشبوو نزیکە لەزیانەوە.

*ئەگەر بینی ئاردی جۆ دەشێلێ پیاوێکی باوەڕداردەبێو دەستەڵاتو ماڵو سامانو سەرکەوتن بەسەر دوژمندا بەدەستدەهێنێ.

(نابلسی) دەڵێت: بینینی هەویر لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کاروباری سووکو ئاسانو نزیکی پشوو چاوەڕوانی دەرووی خێر یان ڕزگاربوونی ئافرەتی دووگیان.

*هەویرماڵێکە بەدەستدێت، ئەگەر هەویرێکی بینی لەماڵی خۆیدا ماڵو سامان بەدەستدەهێنێ لەبازرگانیدا.

*ئەگەر بینی هەویر دەشێلێ کەسێکە لەسەفەردابوو دەگەڕێتەوە بۆ لای.

*ئەگەر لەشوێنێکی تەنگەبەر هەویری شێلا کاری نێربازیدەکات.

*ئەگەر لەشوێنێکی فراوان هەویری شێلا هاوسەردەگرێ چونکە خوداوەند حەلاڵی بەرینو فراوان داناوە حەرامیشی بەتەنگەبەر.

**هەویرشێل:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ڕزقو ڕۆزیو گرنگیدان بەبەرژەوەندی خەڵکی یان بەرژەوەندی دەستەڵاتداری خۆشەویست لای خەڵکی بەزوبانو دەستی.

*شێلەری دانەوێڵەش بەڵگەیە لەسەر باشی پیاهەڵدانو ئەندازیارو بیناساز.

**هەوێ**[1]: (نابلسی) دەڵێت: بینینی هەوێداران لەخەودا بەڵگەیە لەسەر نەخۆشیو زیانو کوێری، دەگونجێت بینینی هەوێ بەڵگەبێت لەسەر کرداری خراپو دەرکەوتنی نهێنیو غەمو پەژارە.

**هەینی**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەربینی خەڵکی نوێژی هەینی دەکەن لەمزگەوتێکداو ئەویش لەماڵی خۆیو فرۆشگەکە یان گوندەکەیدابێتو گوێی لە(الله اکبر)و ویردی چەمانەوەو کڕنووشو گەواهیو سەلامدانەوەبێتو واش بزانێت خەڵکی گەڕاونەتەوە لەنوێژ فەرمانڕەوای ئەوجێیە لەکاردەخرێت.

*ئەگەر بینی پارێزگاری لەنوێژدەکات ئەوە شکۆمەندیو رێز بەدەستدەهێنێت.

*ئەگەربینی نوێژدەکاو لەمزگەوت دێتەدەرەوە خێرو رزقو رۆزی بەدەستدەهێنێت بەپێی ئایەتی: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللهِ وَاذْكُرُوا اللهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾(الجمعة: ١٠).

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی لەرۆژی هەینیدایە گومانێکی باش دەربارەی رووداوێك دەباتو بەو چەشنە نییە.

*ئەگەر بینی نوێژی هەینی دەکات سەفەرێکی خۆش ئەنجامدەداتو ماڵو دارایی لێبەدەستدەکەوێت ئەگەر نوێژەکەی تەواوکرد.

*ئەگەر پەیوەندی بەمیریو فەرمانڕەواوە هەبوو فەرمانێکی بەسەرا دەدرێتو بەجێی دەگەیەنێتو سەرکەوتوو دەبێت.

*ئەگەربینی نوێژی هەینی ئەنجامدەدات ویستوخوازی بەجێدێتو بەهیواو ئاواتی خۆیدەگات.

*نوێژی هەینی لەخەودا بەڵگەیەلەسەر شادیو خۆشیو ئامادەبوون لەشاییو ئاهەنگو جەژنو (حەج)دا.

*ئەگەربینی لەرۆژی هەینیدایەو نوێژی هەینی ئەنجامدەدات بەڵگەیە لەسەر دەروولێکردنەوە لەنزیکداو کۆبوونەوە لەگەڵ خۆشەویستێکداو بەجێهێنانی داوایەك کەوا داوای لێدەکات.

**هەیوان**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەیوانی لەخشت دروستکراو ژنی گوندنشینی ئاینداروە ئەگەر بەگەچ دروستکرابوو دنیایەکی نوێیەو گەر

---

[1] **هەوێ**: ئەو ژنەی بەسەر ژنێکیتر دێت. (وەرگێڕ)

بەخشتی سوور ئەو ماڵەی دەستگیریدەبێت حەرامە.
هەروەها دەڵێن: ژنێکی دووڕووە، گەچو خشتیش لەکردەوەی دۆزەخیو فیرعەونییەکانە.
(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر (دیوانی کیسرایی)بوو دەرکەوتنی دادپەروەرییەو نوێکردنەوەی موڵکو دەستەڵاتەو بەڵگەیە لەسەر ماڵو منالو پلەوپایە.

## هـ ی

**هیوا**: (نابلسی)دەڵێت: هیواو خۆشی نهێنی دەربڕینو مەرگی منداڵە یاخود ژیانەوەی زەوییە ئەگەر زەویداربوو.

## هـ یّ

**هێز**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر هێزو توانای خۆی بینی ئەگەر تێکەڵ بەخەوبوو بەڵگەیە لەسەر خێر ئەگەر خەونەکەی وابەستەی کاروباری ئاینبوو، وەگەرنا هێزو توانای لەکاروباری دنیادایە.
*هەروەها دەڵێن: هێز لاوازییە بەپێی ئایەتی: ﴿مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٖ ضَعۡفًا﴾ (الروم: ٥٤).
(نابلسی) دەڵێت: لەخەودا هێز دوای لاوازی بەڵگەیە لەسەر درێژخایانی نەخۆشیو زیادبوونی بەڵام ئومێدی خێرو تەمەندرێژی بۆدەکرێ.

**هێستر**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: هێستر لەخەودا پیاوێکی بێبنەچەو رەچەڵەکەو جەستە قەبەو گەورەیەو لەکارو ئیشکردندا بەهێزو توانایەو ئەوەی لەخەودا سواری پشتیبوو سەفەردەکات چونکە بەئاژەڵی سەفەر دانراوە مەگەر دوژمنێکی سەرسەختی هەبێت ئەوجا زاڵدەبێت بەسەریاو شکستی پێدەهێنێت، ئەگەر جڵەوی لەدەستداو ئاسنی لغاوەکەشی لەدەمیدابوو، ئەگەر ژنێك شووی کردبوو زەفەر دەبات بەپیاوێك بەوچەشنە.
*هەروەها سواربوونی هێستر بەڵگەیە لەسەر تەمەندرێژیو ژنی نەزۆك.
*هێستری رەشبۆر: جوانەو هەی سەوزباویش باشەو تەمەن درێژییە.
*ئەوەی سواری هێسترێك ببێت هی خۆی نەبێت خیانەت لەپیاوێك دەکات بەدەست تێکەڵکردن لەگەڵ ژنەکەیدا.
*سواربوونی هێستر بەهەڵگەڕاوەیی ژنی حەرامو داوێن پیسە.
*قسەو گوتەی هێستر یان ئەسپ یان هەرشتێك بێتەگۆ خێرێکی وایدێتە رێ خەڵکی پێی سەرسام دەبن.

* ئەوەی لەخەودا بینی هێسترێکی مێینەی دووگیانی هەیە خوازیاربوونی زیادبوونی ماڵو دارایییە، ئەگەر هێسترەکە بەرەکەی دانا ئومێدەکەی دێتەدی، حوشتریش بەهەمان چەشنە کاتێ دووگیانبوو بەرەکەی دانا.
* سواربوونی هێستر بەسەربارەوە ئەگەر ملکەچو رامبوو باشە.
* هێستری لاوازی بێخاوەن پیاوێکی بۆگەنو سپڵەی بیبنەچەو رەچەڵەکە.
* سواربوونی هێسترە مێینەیەکی رەش ژنێکی نەزۆکی خاوەن ماڵو دارایىو شکۆیە.
(نابلسی) دەڵێت: هێستر لەخەودا سەفەرە یا پیاوێکی گێلو کەودەنەو بەناشەرعی لەدایکبووە، ئەوەی ببینێ سواری هێسترێکی رەشی پەل سپی بووەو روو بەقیبلەوە دەچێت حەجکردنە، ئەگەر روویکردە لایەکیتر سەفەرێك دێتە رێی بەرێزداریو شکۆمەندی.
* سواربوونی هێستر بەڵگەیەلەسەر:
+تەمەندرێژی.
+هێنانی ژنێکی نەزۆك منالی نابێت.
* هێستری مێینەش زینو سەرجەم بابەتەکانی تری ژنێکی بەرەوشتو جوانکیلەیەو سەفەریش بێسوودو قازانجە.
* ئەگەر سواری هێستری یەکێکیتربوو خیانەتو ناپاکی لەپیاوێکدەکات بەنزیکبوونەوە لەژنەکەی.
* ئەوەی رەوگە هێسترێك یان حوشترێك ببینێ بەڵگەیە لەسەر فێڵو گزیەك لەمرۆڤێکی خوار خۆیەوە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی.
* ئەوەی ببینێ بوە بەخاوەنی رەوگە هێسترێکی زۆر ماڵو دارایی بێشومار بەدەستدەهێنێت.
* ئەگەر هێستر ملاملانێی لەگەڵ مرۆڤدا کرد بەڵگەیە لەسەر منالی زینای ویستوخواز لاواز.
* ئەوەی ببینێ خودی خۆی بوە بەهێستر پشكو بەشی هەر سەفەرو گەشتکردندەبێت.
* هێستر بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەو ئەوەی لەسەر هێسترەکەی بکەوێتە خوارەوە پلەوپایەکەی لێدەسەندرێتەوە.
* ئەوەی ببینێ شیری هێستر دەخوات مەینەتو نارەحەتی رووی تێدەکات بەئەندازەی زۆرو کەمی خواردنەوەی شیری هێسترەکە.

* هێستر لەخەودا منالّی نێرینەیە یا کورێکە زۆر مەینەت دێتە رێی‌و فرە هەولّو بەئارامەو نەزۆکیشدەبێت.

* هەروەها هێستری مێینە ملکەچی‌و زیندانی پادشاو بەرپرسانە، بۆ ئەوانەی زۆر سەفەر دەکەن سەفەری پڕخێرو کەلّك‌و سوودە.

* بینینی هێسترەکەی پێغەمبەر (ﷺ) نوێکردنەوەی پەیمان‌و بەلّێنە بۆ بەرپرسان لەگەلّ رزق‌و فەرو خێر. ئەمەش بەدەستهێنانی پلەوپایەو شکۆمەندییەو بەرزی ئەوانەیە کەخۆیان بەکەمدەزانن‌و نزیکن لەخەلّکیەوە بەچەشنێك سوودی لێوەربگرن.

(دمیری) دەلّێت: ئەوەی لەسواری هێسترەکەی بێتە خوارەوەو سواری نەبێتەوە لەپلەوپایەی دادەبەزێنرێ یان لەژنەکەی جیادەبێتەوە یا سەفەرەکەی زۆر دەخایەنێت.

**هێلانە:** (نابلسی) دەلّێت: لەخەودا لانەی یەکێکە بالّندە بەلّگەیە لەسەری.

* دەگونجێت هێلانە بەلّگەبێت لەسەر هاوسەرو ئەو سنوورەی کەسێکی زانا لەسەریدەوەستێ.

* بینینی هێلانە بۆ ژنی دووگیان منداڵبوونە.

* ئەگەر هێلانەکە دیوار یان ئەشکەوت یاخود شاخێکبوو هێلانەی بالّندەیە.

**هێلکە:** (ئیبن سیرین) دەلّێت: ئەگەر هێلکەی لەدەفرێکدا بینی بەلّگەیە لەسەر کچی جوانکیلە بەپێی ئایەتی ﴿كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ﴾ (الصافات:٤٩).

* ئەگەر یەکێك ببینێ مریشکەکەی هێلکەدەکات خوداوەند کورێکی پێدەبەخشێ.

* هێلکەی کولاّو رزقێکی سووك‌و ئاسانە.

* ئەگەر بینی بەپیسی دەیخوات مالّێکی حەرام دەخوات یان بەدەست دەهێنێت یاخود گوناهێکی گەورە دەکات.

* خواردنی توێکڵ‌و پێستی هیلکە بەلّگەیە لەسەرنەوەی گۆڕ هەلّدەداتەوە.

* ئەگەر بینی ژنەکەی هێلکەی لێبەربوەوە کورێکی بێباوەڕی دەبێت بەپێی ئایەتی ﴿يُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ﴾(یونس:٣١).

* ئەگەر بینی وەك ئەوەی هێلکە بخاتە ژێر مریشك‌و شەق ببات کارێکی مردووی بۆ زیندوو دەبێتەوەو کورێکی باوەڕداری دەبێت بەپێی ئایەتی ﴿يُخْرِجُ

أكـيٌ مِـنَ الميـتْ ﴾دەگونجێـت بەئەندازەی بارۆکەیەك کوڕێکی ببێت.

* ئەگـەر هێلکـەی خستەژێر کەڵەشێرو چەند بارۆکەیەك دەرهاتن مامۆستایەك دەهێنێت منالەکانی فێر بکات.

* ئەگـەر هێلکەیـەکی شـکاند کـچێك بێبەشدەکات.

* ئەگەر کێشای بەهێلکـەداو ژنەکـەی دووگیـانبوو فـەرمانی پێـدەکات منداڵەکەی لەبار بەرێت.

* ئەگـەر یـەکێکی دی بینـی هێلکـە دەشـکێنێ پیاوێـك کـچەکەی بـێبن دەکات.

* ئەوەی هێلکەی کوڵاو ببینێ کاروباری بـۆ چـاکدەبێت کـەدواخراوە بـۆیو بـــەوکارەش مـــاڵو دارایــــی بەدەستدەکەوێتو کاروبارێکی مـردووی بۆزیندوو دەبێتەوە.

* ئەگـــەر بەتوێکڵـــەوە خـــواردی گۆڕهەڵکەنەیە.

* ئەگەر بـەخواردنی قرقێنـەی دایـەوە ماڵو سامانی ژنـدەخواتو زیادەڕەوی تیادەکات.

* ئەگـەر هێلکەکـەی خـوارد ژنێکـی خاوەن ماڵو دارایی دەهێنێت.

* هێلکـەی لـەق لـەق کـوڕێکی دامـاوە، هێلکەی تووتی کچێکی خواناسە.

* هـەروەها دەڵـێن: ئـەوەی ببینـێ هێلکەیـــەکی پێـــدەدەن کـــوڕێکی پیرۆزیدەبێت.

* ئەگـــەر هێلکەکـــە شـــکا کوڕەکـــەی دەمرێت.

* هێلکە بـۆ پزیشكو ئەوانـەی بژێویان لەسەر ئەو پیشەیەیە بەڵگەیەکی چاكو باشە، بەڵام بۆسەرجەم خەڵکی کەمێك هێلکـە بەڵگەیـە لەسـەر سـوود چـونکە دەخورێـت، هێلکـەی زۆریـش بەڵگەیـە لەسەر خەمو پەژارە.

* زۆرجاریش بەڵگەیە لەسـەر کاروبـاری نادیار.

* پیاوێك هـات بـۆ لای (ئـیبن سیرین)و وتـی: لەخـەودا بینـیم تـوێکڵی هێلکـە دەخۆم، ئەویش وتـی: لەخوابترسـە تـۆ گۆڕهەڵدەکەنی.

* پیـاوێکی رەبـەن بینـی وەك ئـەوەی هێلکەیـــەکی زۆری دۆزیبێتـــەوە، خەوەکـــەی لای خەولێکدەرەوەیـــەك گێڕایەوە ئەویش وتی: بـۆ رەبـەن ژنـەو بۆ هاوسەرداریش منالە.

* پیاوێك بینی وەك ئەوەی هێلکەیـەکی کـولاو پـاك بکـات خەوەکـەی بـۆ خەولێکدەرەوەیـەك گێڕایـەوە ئـەویش وتـی: لـەلای هەنـدێك لەپێـشخزمەتو خزمەتکارەوە ماڵو دارایت پێدەگات.

(نابلسی) دەڵێت: هێلکە بەڵگەیە لەسەر ئاڵتوون‌و زیوو، توێکڵ‌و پێستەکەشی زیوەو زەردیشی ئاڵتوونە.

* هێلکە بەڵگەیە لەسەر:

+منداڵ‌و ژن.

+گۆڕو گڵکۆ.

+کالانی شمشێرو کڵاوی جەنگ.

+کۆبوونەوەی خزم‌و کەس‌وکارو خۆشەویستان لەگەڵ یەك.

+کۆکردنەوەی دینارو جەمکردنی.

* ئەوەی ببینێ هێلکە دەسووێ لەشوێنێك هەروەك چۆن زبڵ‌و خۆڵ بەڵگەیە لەسەر زەوتکردنی ژنی ئەو شوێنە.

**هێلکەو ڕۆن بەئاردەوە:** (نابلسی) دەڵێ: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر شکۆمەندی‌و شایی‌و خۆشی‌و ڕزق‌و ڕۆزی‌و هاوسەر بۆ یەکێك ڕەبەن بێت.

**هێلکەهەڵهێنان:** (نابلسی) دەڵێت: بینینی لەخەودا ڕزق‌و ڕۆزی باش‌و خۆشە.

**هێلکە شەیتانۆکە:** (نابلسی)دەڵێت: بینینی لەخەودا گواستنەوەیە لەشوێن‌و جێگەیەکەوە بۆ شوێن‌و جێگەیەکیتر.

هەروەهادەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر کەوتنەخوارەوە بۆ ژنێکی دووگیان.

**هێڵەکی ئاردبێژانەوە:** (ئیبن سیرین) دەڵێت: پیاوێکە لەبەردەستی ئەودا ماڵ‌و سامانی بەرێز بەدەست دێت.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر ژن‌و خزمەتکارێك دووگیان نابێت‌و ناتوانێت نهێنی بشارێتەوە.

(نابلسی)دەڵێت: بینینی بەڵگەیە لەسەر ڕێنومایی دوای سەرگەردانی‌و تەوبە دوای سەرپێچی.

* دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر دادوەری جیاکەرەوەی حەق لەناحەق.

* هەروەها بەڵگەیە لەسەر زیان‌و پەرتەوازەیی کاروبار چونکە ئارد دابەشدەکات.

* هەروەها دەڵێن: پیاوێکە جیاوازی دەخاتە نێوان خزم‌و کەس‌وکارەوە گوتراوە: شانەکارە.



# یی

## ی ا

**یاخیبوون:** (نابلسی) دەڵێت: لەخەودا بەڵگەیە لەسەر ئەو نەخۆشیەی روودەکات لەدەم و پێویستی بەوەدەبێت چارەسەر بکرێت و دادەبەزێت بەسەر ئیرادەو ویستی دابەزیوودا، هەندێك لەشارەزایان دەڵێن: بەتێکچوونی خەڵکی بەگشتی فەرمانڕەوای خراپ سەردەردەهێنێت و تێچکوونی تایبەتیش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی چاوبەستکەران لەئایندا.

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر بینی لەخەودا یاخیبوە بەکرداری خراپەو پێی نزیکدەبێتەوە لەدۆزەخ.

* یاخیبوون رسواکردنی خاوەنەکەیەتی، هەموو یاخیبوونێك رسواییە.

* یاخیبوون هەژاری و غەم و پەژارەیە دادەبەزێ بەسەر ئەوەدا کەیاخیبوە یان نەخۆشییەو ماڵ و دارایی تێدا زەرەردەکات، دەگونجێت دەستکەوتبێت دوای ئەوە هەژاری بکەوێتەوە.

**یادی خوا:** (نابلسی) دەڵێت: ئەگەر پیاوێك لەخەودا بیبینێ وەك قورئانخوێندن وایە، دوعاو هۆنراوە لەبارەی دنیانەویستی و بەندایەتی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو باورحاڵە بەباشی ئاوەداندەکرێتەوەو بەئەندازەی خوێندنەوە بەشێوەیەکی دروست.

* ئەگەر هۆنراوەی دنیا نەویستی بەئاوازەوەبوو دەستەلاتیان تەواو دەبێت.

* ئەگەر هۆنراوەکان غەزەلبوو دەستەلات پێسپاردنە بەڵام پووچ و بەتاڵە.

* ئەگەر بینی یادو زیکری خوداوەند دەکات بەزۆری زاڵدەبێت بەسەر دوژمەکانیدا، یادگەریش بۆ خەڵکی پیاوێکی مۆچیاریدەرەوە خەڵکی

قوتاردەکات لەگوناهو هەڵەکانیان، ئەگەر بازرگانبوو لەزیان قوتاریاندەکاتو سوودمەنددەبێت.

* ئەگەر بینی یادیدەخاتەوەو خۆی شایستەینەبێت لەغەمو پەژارەو نەخۆشیدایەو دوعا بکات هەتا خوداوەند دەرووی لێبکاتەوە.

* ئەگەر قسەی چاکەو پڕ لەداناییکردو راستگۆبوو لەیادکردنەکەدا دەرووی لێدەکاتەوە چاکدەبێتەوە لەنەخۆشیەکەیو لەتەنگەژە قوتاردەبیٚو ئەو قەرزەی لەسەریەتی دەیداتەوە یاخود تەماشای ستەمکار دەکات، ئەگەر بەلووت قسەیکرد قورسوگراندەبێت لەسەریو قسەدەکات لەبارەی شتێکەوە گاڵتەی پێدەکریٚ.

**یارانی پێغەمبەر(ﷺ):** (ئیبن سیرین) دەڵێت: هەرکەس یەکێك لەیارانی پێغەمبەر(ﷺ) ببینیٚ یان هەموویان بەڵگەیە لەسەر بەهێزی ئاینو هەڵگرانی پەیام.

* ئەگەر خۆی بینیەوە لەنێویانداو بوو بەیەکێك لەوان بەلاٌو نەهامەتی روی تێدەکات پاشان دەرووی خێری لێدەکرێتەوە.

* ئەگەر لەخەودا ببینیٚ چەند یارێکی حەزرەت(ﷺ)بژێویو باری ژیانی بەباشی دەچێت بەڕێوە.

(نابلسی) دەڵێت: هەرکەس لەخەودا یاران ببینیٚ بەسیفەتو تایبەتمەندیە جوانەکانیانەوە بەڵگەیە لەسەر راوبۆچوونی باشی بەرامبەریانو شوێنکەوتنی سوننەتیان، دەگونجێت بینینیان بەڵگەبێت لەسەر جموجوولّی سەربازیو ناردنی نوێنەر بەملاولادا.

*بینیان بەڵگەیە لەسەر بلاٌوبوونەوەی زانستو فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە.

*بینیان بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستیو برایەتیو تەباییو یارمەتیو هاوکاریو سینەسافی لەخەشمو قینو ئیرەیی بردنو ، هێمنیو سالاریو لەسەرخۆیی.

*ئەگەر خەوبین هەژاربوو دەوڵەمەند دەبێت چونکە یاران (رەزای خوایان لێبێت) فتوحاتیان بەرپاکردو دەستکەوتیان دەستکەوت.

*ئەگەر خەوبین دەوڵەمەندبوو قیامەت زاڵدەکات بەسەر دنیاداو نەفسو ماڵی لەپێناوی پەروەردگارا دەبەخشیّ.
*بینینیان بەڵگەیە لەسەر بیناو شوێنی پیرۆز وەك مزگەوتو پاکێتی رەچەڵەکو هۆزو تیرە.
*نکوولی کردنیان بەڵگەیە لەسەر باسکردنی جیاوازی نێوانیانو زاڵکردنی هەندێکیان بەسەر ئەوانی دیکەداو رقو قین گرتن لەهەندێکیان.
ـ بینیان بەڵگەیە لەسەر تەوبەو پەشیمانیو یەکلاییوونەوە بۆ خوداوەند.
*بینینی یاران (رەزای خوایان لێبێت) بەڵگەیە لەسەر خێرو بەرەکەت بەپێی پلەوپایەو ئاستیانو ژیاننامەی شیرینو رێبازی بەرزیان.
*دەگونجێت بینیان بەڵگەبێت لەسەر ئەو بەلاو گرفتو نەهامەتیانەی لەرۆژگارەکانی ژیانیاندا رووی تێکردن لەگەڵ دادپەوەریو یەکسانی بالا.
*ئەوەی ببینیّ لەگەڵ یارانی پێغەمبەردا(ﷺ) حەشر دەکرێت داواکاری جێگیربوونە لەئاینو رێبازی خودایا.

*بینینی یارانی پشتیوانو وەچەکانیان لەخەودا بەڵگەیە لەسەر تەوبەو داوای لێخۆشبوون.
*بینینی یارانی کۆچبەریش بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی بەخوداو دەرچوون لەدنیاو دنیانەویستیو راستگۆیی لەوتەوکرداردا.
**یاری( بازی ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر لەخۆباییوونو گاڵتەکردنو کەمو کوڕی لەئایندا.
*یاریکردن بەزار: بەرزیوشکۆمەندییە، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەرئەوەی لەکاتی بێداریدا ئەنجامی دەدات لەگاڵتەو پێچەوانەبوون.
*یاریکردن بەزار دانانو کارپێسپاردنە.
*یاریکردن بەئەموستیلە: داپۆشینی فەرمانە مەگەر لەخەودا بەدەر بکەویّ لەگەڵ کەسێکدا، دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر تیاچوون.
*یاریکردن بە کلۆڵەو شلیلەو هەڵماتو خەشیلە: ئاشتەواییە لەنێوان دوژمناندا ئەگەر یاریزان نەخۆش بیّ چاکدەبێتەوەو باشدەبیّ.
*یاریکردن بەگوێز: ئاژاوەو شەڕە ئاشتی بەدوایدا دێت لەگەڵ پشوودان.

**یاسمین(ئەسمەن)**[1] :(ئیبن سیرین)دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر لەشساغیو رواندنیشی بەڵگەیە لەسەر کوڕێکی ژیرو لەش ساغ. هەروەها بەڵگەیە لەسەر هێنانی ژنێك کەتێکەڵبوون لەگەڵی درێژە دەخایەنێت.

*ئەگەر ژنێك بینی بۆنی یاسمینێك دەکات کوڕێکی باوەڕداریدەبێت.

(نابلسی)دەڵێت: دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر کارێك کەوا بەردەوام نابێت.

*دەگێڕنەوە پیاوێك دێت بۆلای (حەسەن)ی (بەسری) (رەحمەتی خوای لێبێت) و دەڵێت: لەخەودا بینیم فریشتە لەئاسمانەوە دادەبەزیو یاسمین هەڵدەگری ، (حەسەن) کەمێك راماو پاشان وتی: زانایانی (بەسرە) کۆچیانکردوە.

*هەروەها دەڵێن: (یاسمین) بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارە.

(نابلسی)دەڵێت: ئەگەر لەخەودا (یاسمین)ی دۆزیەوە یاخود بینی خۆشحاڵیو خێری دەستگیر دەبێت هەروەها بەڵگەیە لەسەر زانایان.

*ئەگەر دەمی نەکردبوەوە بەڵگەیە لەسەر هاوسەرگیری رەبەن.

*ئەگەر سەرمابردەبوو یاسمینی بینی لەخەودا ئەو ئێشو ئازارەی رووی تێکردوەو دەڕەوێتەوە چونکە یاسمین گەرمو وشکە بۆ یەکێکی هێمنو دەروون ئارامو هێمنو باشە.

**یاقوت(گەوهەری شەوچرا)**: (ئیبن سیرین)دەڵێت: یاقوت خۆشیو شادییە، ئەگەر نقێمی ئەموستیلەکەی یاقووتبوو چاوەڕێی کوڕبوو کچیدەبێت، ئەگەر ویستی هاوسەرگیری ئەنجامبدات هاوسەرێکی شۆخو شەنگدەهێنێ کەبەدینو بەڕەوشتدەبێ بەپێی ئایەتی: ﴿ كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ﴾ (الرحمن: ٥٨).

*ئەگەر بینی لەقووڵایی دەریا یاخود نێو رووبارێکدا یاقوتێکی زۆری دەرهێنا بەکێشانە پێورا ماڵو سامانی زۆری لەلایەن دەستەڵاتدارەوە پێدەگات.

*یاقوتێکی زۆر بۆ زانا زانیارییەو بۆ بازرگان بازرگانییە.

*هەروەها گوتراوە: یاقوت هاوڕێیە، ئەگەر بینی تەماشای یاقوتدەکات کەواهیچ رووناکییەکی نییە یان تەماشای شووشەیەکی بێڕووناکیکرد بائاگاداری خنکاندنو ناڕەحەتیبێت

---

[1] **یاسمین(یاسمەن)**: گوڵێکی جوانە. (وەرگێڕ)

یاخود لەکیسدانی ئەقڵو ژیری بێت،
ئەگەر یاقوت هاوڕێبێت دڵڕەق دەبێت.
*ئەگەر بینی تاجەگوڵینەی یاقووتی لەسەردابوو شکۆمەندیو بەرزیو هێزە لەلایەن ژنەوە.
*هەندێکدەڵێن: یاقوت دەدرێتە پاڵ ژنان تا دەپێوریٚ ئەوجا ماڵو سامان دەبێت.
*ئەگەر یاقوتێکی پێدرا ژنێکی شۆخو شەنگ بەدەستدەهێنێت.
(نابلسی)دەڵێت: دەگونجێت یاقوت بۆ هەژاران نانو پاروبێت بەدەستی بهێنێت، یاخود قورئانێك بێت بژێوی بۆ پەیدا بکات، بۆ نەخۆشیش قوتاربوون بێت لەئاگر.
*ئەگەر نقێمی یاقوتێکی سووری لەدەستیدابینی ژنێکی شۆخو شەنگی دڵڕەقی خۆشدەوێت.
*ئەگەر نقێمێکی بەدەستیەوە بینی لە(یاقوت) دەچوو بەلام یاقوت نەبوو بانگەشەی ڕێزداریدەکاتو بەوچەشنە نییە.
**یانەی مەی**: (نابلسی)دەڵێت: یانەی مەی بەڵگەیە لەسەر چوستو چالاکی دوای لاوازیو غەمو پەژارە.
*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر:
+ژنی زیناکار.
+غەمو پەژارە.
*ئەوەی کاتی بەسەربردنی پەیمانێکی بێت دەیباتەسەر. ئەگەر نەخۆش بێت وادەوکاتی هاتووە، ئەگەر خۆپارێزبێت ترسی فیتنەو ئاشووبو لێدانی هەیە، ئەگەر ڕێنموویی کرابێت پاشگەزدەبێتەوە.

## ی و

**یوسف( سەلامی خوای لێبێت )**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەوەی (یوسف) ببینیٚ ستەمو زیندانیو زۆرداری خزمەکانیو تاوانبارکردن رووی تێدەکاتو پاشان موڵكو دەستەلات بەدەستدەهێنیٚو دوژمنانی ملکەچدەبن بۆی.
*دەگێڕنەوە هەندێك کەس لەخەودا (یوسف) یان بینیوە یەکێك لەسۆڵەکانی پێداوەو دوای بێداربوونەوەو پاش ماوەیەك بوو بەراڤەکاری خەو.
*دەگێڕنەوە لە(ئیبراهیم)ی کوڕی (عبدالله)ی (کرمانی)یەوە (یوسف)ی لەخەودا بینیوەو گوفتاری لەگەڵ کردووەو وتویەتی: فێری ئەو زانیارییەمبکە خوداوەند فێری کردوویت، ئەویش کراسەکەی خۆی پێدەداتو کاتیٚ لەخەو هەڵدەستیٚ بوە بەیەکێك لەراڤەکاران.

*لـه(ئـيبن سـيرين)ەوه دەگێڕنـەوه دەڵێـت: لەخـەودا بينـيم چـوومە مزگەوت، سێ شێخو لاوێكی رووخسار جوان لەپاڵما دانيشتن، بەلاوەكـەم وت خوالێـت ببـورێ تـۆ كێيـت ؟ وتـی: (يوسـف)م وتم: ئـەی ئـەو پـيره ريش سـپيانە؟ وتـی: بـاو باپيرانمـە، (ئيـبراهيم)و (ئيـسحاق)و (يـەعقوب)، وتم: فێـری ئـەو زانياريـەم بكـە كەخوداوەند فێريكردووی، ئنجا دەمی ئاوەلاكردو وتی: بنوارە چی دەبينی؟ وتم: زوبـانو زارت دەبينـيم وتـی: تەماشـاكە چـيدەبينی؟ وتم زوبانـە گچكەت ئنجا زاری كردەوەو وتـی: چی دەبينی؟ وتم: دڵت، وتـی: راڤـەی خـەو بكەو مەترسە، ئنجا هەر خـەوێكيان بۆ دەگێڕامـەوە وەك تەماشـای دەسـتم بكەم ئاوا دیارو روونبوو لام.

(نابلـسی)دەڵێـت: بينينـی لەخـەودا بەڵگەيە لەسەر دەستەلات، دەگونجێت لەسـەر دەمـی گرانـیو نـەبوونیو لەدەسـتدانی خانـەوادەو خـزمو كەسوكاردابێ.

*هـەروەها بينينـی بەڵگەيـە لەسـەر زينـدانو قوتـاربوون لێـیو نـەبوونیو بەختو لەلای ژنان بەهۆی جوانيەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسـەر زانيـاری راڤەكردنی خەو.

*دەگونجێـــت زاڵبێـــت بەســـەر دوژمنەكانيداو لێبوردەبێ.

*دەگونجێت بينينی بەڵگـەبێت لەسـەر دەريا روبار هەڵكەندنو ئاو گواستنەوە ياخود گواستنەوەی مردوو لەوڵاتێكەوە بۆ يەكێكيتر.

*دەگونجێت كارێكی لەرادەبەدەری بـۆ دەربكەوێت بـەهۆی گەڕانـەوەو بينينـی باوكی بەكراسەكەی كەبۆينارد.

*كراسەكەی لەخـەودا بەڵگـەيە لەسـەر رەواندنـــەوەی غـــەمو پـــەژارەو چـاكبوونەوە لەنەخۆشـی ، ئەگـەر خـوێنی پێوەبـوو بەڵگـەيـە لەسـەر جيـاوازیو زينـدانی ئەگـەر پارچـە پارچەبوو بەڵگەيە لەسەر تومەت.

*ئەگـەر ژنێـك (يوسـف)ی بينـی نـازو نيعمـەتی بەسـەر دەچـێتو چـاوی كـوێردەبێو دەروازەكـانی لێـدەگيرێو ئەوينێكی گـەرم لەدڵيـدادەبێ بەرانبـەر رێـزداران. ئەگـەر تێكيـدابوو تەوبـەو دەكـاتو بـەهيوای خـۆی يـاخود هاوسـەردەگرێ ئەگـەر رەبـەنبوو دەوڵەمەنـددەبێت، ئەگـەر هـەژاربێو دەرەنجـامو چارەنووسـی لـەدنياو قيامەتدا باشدەبێ.

*ئەگەر منداڵێك خەوێكی ئاوای بینی پشك و بەشی لەنێو براكانیدا كەمدەبێ.
*ئەگەر (یوسف)ی بینینی درۆ دەكرێ بەدەمیەوەو بەستەم زیندانی دەكرێ و ناڕەحەتی رووی تێدەكات، پاشان دوای ئەوە دەسەڵات و موڵك بەدەستدەهێنێ لەگەڵ سەركەوتن و شكۆمەندی.
*هەروەها گوتراوە: ئەوەی (یوسف) (سەلامی خوای لێبێت) ببینێ ئەوە بەڵاو فیتنەو نەهامەتی رووی تێدەكات لەلایەن براكانیەوە لەپیلانگێڕان هەتا زیندانیدەكرێ، پاشان قوتاردەبێت لەزیندان و خوداوەند بەندایەتی پێدەبەخشێ بەستایش و زیكری خۆی رێزدارو پشتگیریدەكات دوای لاوازی و زاڵیدەكات بەسەر هەموو دوژمنەكانیداو خەڵاتیان پێدەدات و چاوپۆشیان لێدەكات.
*ئەگەر (یوسف)ی بینی گفتوگۆی لەگەڵدەكرد یاخود شتێكی پێدەدرا دەبێت بەراڤەكاری خەوو زانیاری بەروار دەزانێ.
*ئەگەر (یوسف)ی بینی لەئاوارەییدا خێری دەستگیردەبێ، ئەگەر زیندانی بێت قوتاردەبێ و دوژمنانی ملكەچدەبن و زەفەریان پێدەبات، ئەگەر نادیاربێ دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمانی خۆی، ئەگەر خوازیاری پلەوپایەبێت بەدەستیدەهێنێت.
*ئەگەر كەسێكی خوازیاری هاوسەرگیری بینی دەگات بەویست و خوازیخۆی.

**یونس( سەلامی خوای لێبێت )**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر (یونس)ی بەدیكرد پەلەدەكات لەكارێكدا بۆی دەمێنێتەوەو زیندانی لا ناڕەحەت دەبێت ، پاشان خوداوەند قوتاریدەكات، ئەم خەونە بەڵگەیە لەسەرئەوەی خاوەنەكەی زوو تووڕەدەبێ و لەگەڵ گەل و نەتەوەیەكی ناپاكدا مامەڵەیدەبێت.

**یـە**

**یەحیا( سەلامی خوای لێبێت )**:ئەگەر (یەحیا)ی بینی سەركەوتوو دەبێ لەپاكێتی و خواناسیداو هەتا دەبێت بەیەكێك لەكەسە ناودارەكانی سەردەمی خۆی.
(نابلسی) دەڵێت: ئەوەی لەخەودا ببینێ خواناسی و پارێزراوی لەبەڵاو نەهامەتیەكانی پێدەدرێ و بەپێی ئایەتی: ﴿ لم نجعل له من قبل سميا﴾ (مريم: ٧) و ئایەتی: ﴿ وسيداً

﴿وحصورا ونبيا من الصالحين﴾ (آل عمران : ٣٩).

*ئەگەر (یەحیا)ی بینی ژیانو دەوڵەتداریو مژدەیە رووی تێدەکات.

**یەعقوب( سەلامی خوای لێبێت ):** (ئیبن سیرین)دەڵێت: ئەوەی (یەعقوب) (سەلامی خوای لێبێت) ببینێت غەمو پەژارە رووی تێدەکات لەلایەن هەندێك لەمنداڵەکانیەوە، پاشان خوداوەند دەرووی لێدەکاتەوە.

(نابلسی) دەڵێت: ئەوەی لەخەودا ببینیێ خۆشەویستیو هێزو نازو نیعمەتێکی دیاری پێدەبەخشرێ لەگەڵ هاوسەرو منداڵی دیارو بەرچاو لەلایەن یەکێکیانەوە غەمو پەژارەی پێدەگاتو دواتر خۆشحاڵدەبێتو چاوی گەشدەبێ بەوەی خوداوەند پێیداوە.

*ئەگەر (یەعقوب)ی بینی (سەلامی خوای لێبێت) بەگوێرایەڵی لەخوداوەند نزیکدەبێتەوەو یارمەتی هەژاران دەداتو غەمو پەژارە رووی تێدەکات.

دەگونجێت بینایی چاوانی لەدەستبدات، پاشان خوداوەند بۆی بگێڕێتەوە، ئەگەر کەسێکی ئاوارەبوو بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە بۆ لای، ئەگەر نادیارێکی هەبوو خوداوەند بەیەکەوە کۆیاندەکاتەوە.

*دەگونجێت بەڵگەبێت لەسەر نەخۆشیەك تووشیدەبێت، یاخود تاقیکردنەوە رووی تێدەکات بەهۆی منداڵەوەو دەرەنجامەکەی بەخێر کۆتاییدێت ئەگەر خوداوەند رەزامەندی لەسەربێ.

*بینینی (یەعقوب) (سەلامی خوای لێبێت) بەڵگەیە لەسەر غەمو پەژارەو لەدەستدانی خزمو کەسوکارو ئەوەی ئازیزە لەلای منداڵان.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی پلاندەگێڕێ لەماڵو منداڵی.

*هەروەها بینینی بەڵگەیە لەسەر لاوازی دیدو چاویو چاکبوونەوەو یەکانگیری لەگەڵ ئازیزو خۆشەویستانو قوتاربوون لەناڕەحەتی.

*دەگونجێت بینینی بەڵگەبێت لەسەر:

+راڤەکاری خەو.

+ماڵو سامانی زۆر.

+سەفەر.

+بەرزی نرخ.

+باشی کاڵاو شتومەکی.

+تیاچوونی شتی دیار.

+دەرەنجام باشی لەخانەوادەو ماڵو منداڵدا.

*ئەگەر ژنێك (یەعقوب)ی بینی دەترسێ لەچارەنووسی کوڕەکەی کەزیندانی بکرێ یان توهمەتی بۆ دروستبکرێو بێتاوان دەبێت لەوەی بۆیدروستکراوە.

**یەکتر لەئامێزگرتن**:(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی کەسێکی زیندو لەئامێزدەگرێ تێکەڵبوونێکی دووورودرێژ تێکەڵدەبێ لەگەڵیدا بەپێی ماوەو چۆنیەتی لەئامێزگرتنەکە بەو ئەندازەیەش خۆشەویستی بەدەستدەهێنێ.

*ئەگەر مردوویەك لەئامێزیگرتو گرتنی دەمرێ چونکە لەئامێزگرتن کورتەو پابەندیش درێژە دەخایەنێ.

*ئەگەر بینی ژنێك لەئامێزدەگرێ باوەشی بۆ دنیا گرتوەتەوەو پاشەڕۆژو قیامەتی فەرامۆشکردوە.

**یەك کەڵەچاو**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: ئەگەر پیاوێکی بینی یەك کەڵەچاوبوو بەڵگەیە لەسەرئەوەی پیاوێکی باوەڕداری راستگۆیە لەگەواهیدا.

*ئەگەر خەوبینەر خراپەکاربوو نیوەی ئاینەکەی دەڕوات یاخود گوناهو تاوانێکی گەورە ئەنجامدەدات دەگونجێت نیوەی تەمەنی بەسەر چووبێت، یاخود نەخۆشدەکەوێو لەلێواری مەرگ نزیکدەبێتەوە.

*دەگونجێت نەفسی یاخوورەوشتو کوڕەکەیو ژنەکەیو شەریكو هاوکاری بمرێ یان نازونیعمەتی لێوەربگرێتەوە، خوداوەند دەفەرموێ: ﴿ ألم نجعل له عينين (٨) ولساناً وشفتين (٩)﴾ (البلد: ٨ـ ٩)

(نابلسی) دەڵێت: ئەگەر لەخەودا بینی بوە بە یەك کەڵەچاو ماڵو دارایی نیوەدەبێ یان ئاینەکەی بەباشی بەجێناهێنێت یاخود گوناهو تاوانێکی گەورە ئەنجامدەدات، دەگونجێت نیوەی تەمەنی بەسەرچووبێت.

*هەروەها دەڵێن: چاوەڕێی سوودو قازانجە لەلایەکەوە پێبگات.

*هەروەها دەڵێن: ئەگەر براو کوڕداربێ یەکێکیاندەمرێت.

**یەکگرتنەوە**:(ئیبن سیرین) دەڵێت: کۆبوونەوەو یەکگرتنەوە دوای لەیەك

جیابوون بەڵگەیە لەسەر نەمانو لێك جیابوونەوە بەبەڵگەی ئەم ئایەتە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا﴾(یونس:٢٤).

*هەروەها دەڵێن: كارێك تەواوبوو یەكیگرتەوە نەمانی دێ بەپیرتەوە.

(نابلسی) دەڵێت: یەككرتنەوەی خۆشەویستان لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هاوسەر.

*ئەگەر بینی لەگەڵ منداڵێكدا دانیشتوەو خۆشی دەوێت هاوسەردەرگرێ، ژنیش بەهەمان شێوەیە ئەگەر بینی لەگەڵ ئازیزێكدا دانیشتوە شوودەكات بەپیاوێكو لەنێوانیاندا خۆشەویستیو تەبایی بڵاودەبێتەوە.

*ئەگەر بینی یەكیگرتەوەو توانی زاڵبێت بەسەر ئاستەنگەكانی دنیادا حاڵو باری دەگۆڕێو كەمێك شاددەبێت.

*ئەگەر خۆشەویستەكەی سەردانیكرد تووشی خۆشیو شادیدەبێت.

**یەكێتی(تەبایی)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: یەكێتی لەخەودا ملكەچیو رسوایيو هەژاریو لابردنی دەستەلاتداره.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا تاككەوتنی كەسێكە لەو پیشەو رایەی هەیەتی.

*ئەگەر فەرمانڕەواو پادشایەك بینی بەتەنیایيە بەبێ وەزیرو كەسێك لەگەڵیدابنیشێ یان كەس وەڵامی ناداتەوە یان پیاوێكی گشتی خەڵكییەو هەژار دەكەوێ یاخود خۆشەویستەكەی بەجێیدەهێڵێ.

# پێڕستی پیتو وشەکان

| ژ | وشه (بابەت) | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ٥٥ | شەمشەمەکوێرە | ٨٣٢ |
| ٥٦ | شەو | ٨٣٢ |
| ٥٧ | شەوبێداریی | ٨٣٥ |
| ٥٨ | شەوق پەیداکار | ٨٣٥ |
| ٥٩ | شەوگەرد | ٨٣٥ |
| ٦٠ | شەونم | ٨٣٥ |
| ٦١ | شەیپوڕ(هۆڕن . زوڕنا) | ٨٣٥ |
| ٦٢ | شەیتان | ٨٣٦ |
| ٦٣ | شەیدایی | ٨٣٨ |
| | ش ی | |
| ٦٤ | شیث(سەلامی خوای لێبێت) | ٨٣٨ |
| ٦٥ | شیرا | ٨٤١ |
| ٦٦ | شیردان | ٨٤١ |
| ٦٧ | شیرفرۆش | ٨٤٢ |
| ٦٨ | شیرەوان | ٨٤٢ |
| ٦٩ | شیرینساز(شیرینچی) | ٨٤٢ |
| ٧٠ | شیرینی(حەڵوا) | ٨٤٢ |
| ٧١ | شیشی گۆشت برژاندن | ٨٤٢ |
| ٧٢ | شیعر(هۆنراوە) | ٨٤٣ |
| ٧٣ | شیکەرەوە(هەلاج) | ٨٤٣ |
| ٧٤ | شیلاقە(باڵندەیەکە) | ٨٤٣ |
| ٧٥ | شیلان(گەمەری شەوچرا . عەنناب) | ٨٤٤ |
| ٧٦ | شین و زاری | ٨٤٤ |
| | ش یٚ | |
| ٧٧ | شێتی | ٨٤٥ |
| ٧٨ | شێر | ٨٤٥ |